


# مەوسوعەی جودی

**بەرگی دووەم**

**نووسـینـی**
مەسعـود عبدالخـالق

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە**
نەوشیروان کاوانی

**خـــەت**
نــەوزاد کۆیـی

**بــــەرگ**
ئەمین موخلیس

**قەبارەی کتێب**
٢٤×١٧- ( ٧٦٦ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٨ ك - ٢٠١٧ ز

**تــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٣٥٦ ) ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا -

# مەوسوعەی جودی دووەم

## 54- نەزەریەی موئامەرە



## 55- کۆمەڵگەی مەدەنی



## 56- عەبەسی



## 57- هۆڵۆکوست



## 58- مارکسی

## 59-**ئایدیۆلۆجیا**

ئەوانەش دەگریتەوە(doctrine ،لۆگۆس، میتۆس، ئایدیۆلۆجیای جاکۆپیان،بیلیڤ، زکگورتی،..)

## 60-**ناسنامە**

ئەوانەش دەگریتەوە (کۆسمۆپۆلۆتی، هویات عملاقە، سۆویت ، دەولەتی شار،ایام العرب، ..)

..............................

## 61- **هاوپەیمانی**

**ئەوانەش دەگرێتەوە( ناتۆ، هاوپەیمانی وارسۆ، هاوپەیمانی داخراو، حلف مقدس، هاوپەیمانی کراوە ، حلف سەنتۆ، حلف بغداد، ترتیب الاولویات، هاوپەیمانی ستراتیژی ،** وولاتانی هاوپەیمان،**ماترینختی، مارکۆزی،..)**

..................................

## پیشەکی

ئیش کردن لەسەر مەوسوعە وەك كتێبێكی ئاسایی نیە یان وەك تویژینەوەیەكی ئەكادیمیش، لەوان لەسەر یەك بابەت قوول دەبیەوە و كۆتایی دێت، كەچی بۆ مەوسوعە هەرچەمك وزاراوەیەك تویژینەوەیەكی سەربەخۆی پیویستە ،وەك ئەوە وایە چەند چەمك تۆمار دەكەی واتە ئەوەندە تیزەی ئەكادیمیت پیشكەش كرد،بۆیە عادەتەن ئەو كارە بەتاكە كەسیك ناكری ،لەو بارودۆخەی كوردستان كە ئەوەندە گرنگی بەو جۆرە تەقەلایانە نادریٚ كەمتر هاریكاری فكری وزانستمان دەست دەكەویٚ ،بۆیە حەتمەن كەم وكورِی زۆر دەبیٚ ،بەلام نابیٚ كۆل بدەین لە تەقەلای خۆمان بەردەوام دەبین ، چونكە نوسینی مەوسوعە بینای دروست كردنی مەعریفەی خۆمالیە،ئەگەر نەڵێین دروست كردنی ئایدیۆلۆجیا كوردستانیە بەلام دەتوانین بڵێین دارِشتنی ئەو بینا زانست وزانیاریەیە كە بۆگەشەی كۆمەلگەكەمان پیویستە ،ملی ریٚی گەشە بگریت ،چیتر پاشكۆ نەبیٚ ،بەدوای پیخوستی خەلكی تر نەكەویٚ ،دەبتە بنچینەیەك بۆ ئەوەی بزانریٚ چۆن سوود لە ئەزمونی بەشەری وەرگیریٚ بیئەوەی لەفەرهەنگی ئەو بتاوێیەوە،ئەوە پەیامیكی هەمو ئاینیكی رەسەنیشە كە خوای گەورە ئادەمیزادی بۆ بەرپاكردنی شارستانی دروست كردوە ،وەك ئەرك خستوویەتە سەر شانی مرۆڤ, لەو بارەیەوە لەو سەردەمە دەبینیت كەمتەرخەم ترین میللەت میللەتانی موسوڵمانە لە بارەی (ئیعمار) و بەرپاكردنی شارستانی، بۆیە لەكاروان بەجیماون ، میلەتی كوردستان زیاتر بەجیماوە بەهۆی داگیركاری سەربار، نەیتوانیە ئەو پەیامە لە خۆی بەرجەستە بكا، ئەو پەیامەش بە زانیاری دەست پیدەكا بۆ فلسفەو زانست وبۆ تكنۆلۆجیاو بۆ شارستانی ،ئەو شارستانیە دادگەر نابیت ئەگەر ئایدیۆلۆجیایەكی مرۆڤایەتی هاوتا نەبیت ، ،سەرەتای هەمو شارستانیەكان بە مەوسوعە دەستی پیكردوە،یان وەك خوارزمی دەڵیت دەستپیكی زانست وشارستانی لە زاراوە زانی دەست پێدەكات ،بۆیە ئەو كارەی ئیمە فرە ئارِستە وفرە ئامانج دەپێكی لەهەمان كات فرە ئەرك و پسپۆری پیویستە ،تەقەلایەكە هەم زەحمەتە هەم گرنگە ،بەتایبەتی لە فەزایەك كە ئەو جۆرە تەقەلایە زۆر كەم بێت، ئێمە ناتوانین سەربەخۆی مەعریفە بۆ میلەتەكەمان فەراهەم بكەین ئەگەر سەربەخۆییو خۆمالی كردنی چەمك وزاراوەكان نەكەین ،كەچی دەبینین نەك كورد هەتا عربیش زۆربەی چەمك وزاراوەكانی هێناوە لە

ڕۆژئاوا تەنها ووشەیەکی عربی بۆ داناوە ،وەك (د عبدالوهاب المسیری )دەڵێت :هەمو زاراوەکان لەدەرەوەبۆمان هاتوون بێئەوەی بە ڕوانگەی خۆمان پیناس کرابێت یان ئیمە هەڵمان بژاردبێ ، لە شوێنیکی تر دەلیت جاروایە عرب جەوهەری زاراوەی زایۆنی بەکارهێناوە بیئەوەی هەست پیبکات[1]، ،جا ئەرکی چەندە قورس دەکەوێتە سەرشانی ئەو مەوسوعەیەی ئێمە ، هەندێ تەقەلای تری پیشوو وئیستاش هەبوە زۆر جیگەی ڕێزە ویارمەتی گەورەی خوینەرانی کوردستانی داوە ،بەلام بە پێی زانیاریمان مەوسوعەیەکی داهینانی بیری کوردی نەبوە تائیستا گوزارش لە ئایدیۆلۆجیایەکی کوردستانی بکا ،ئەوەی لیرە لەبەردەستتدایە تەقەلایەکە بەو ئاڕستەیە .

لە بەرگی یەکەمی ئەو مەوسوعەیە سەربردەو پیویستی وەها مەوسوعەیەکمان باس کرد، بەلینی بەرگ دوەم وسێیەمیشمان دابوو ،خواستی یەکجار زۆر بوو لەلایەن خوینەر وتویژەر،هانیاندایین خیراتر پییهەلسین، ئەگینا نوسینی مەوسوعە کاری یەك کەس نیە ، وەك تویژینەوەیەکی ماستەرودکتۆراش نیە هەرتەنها خەمی یەك بابەتت لەملی بێت ،چەند چەمك وزاراوە تۆماردەکەی هەریەکەو تویژینەوەیەکە بە هەمو پیویستیەکانی ،بۆیە ئیشیکی زۆر قورسە ،بەلام پشت بە خوا دەستمان پیکردو ئەو بەرگەشمان پیگەیاند ،ئەو تیبینی وهەلوەستانەی لەبەرگی یەکەم کردوومانە بۆ ئیرەش ڕاستە لەگەل ئەو زیادانەی خوارەوەش:

1- دەگۆترێ یەکەم جار لە جیهان (یونگلدادیان) کۆن ترین ئینسیکلۆبیدیایە لەچین نوسرایتەوە،وەك ناویش لەلایەن (ئەفرایم تچیپریز) ناوی (ئەنسیکلۆبیدیا)هاتە کایەوە ،یەکەم ئەنسیکلۆبیدیا لە ئەوروپا بریتی بوو لە(موسوعە الفنون والعلوم والحرف) لەلایەن دیدرۆ(1713-1784) نوسرا،بەلام (ریمۆن گینۆ)ی فرنسی دەلیت یەکەم ئینسیکلۆبیدیا بریتیە لە (رسائل اخوان الصفاء)، دەشڵێن لە شارستانی ئیسلامی یەکەم جار (احمد ئیشبیلی ) زاراوەی (معجم)ی بەکارهیناوە ئینجا کوردیك بەناوی (زین الدین عراقی)ئینجا عبدالرزاق الکاشانی لە (اصطلاحات الصوفیة) ،دەشگۆترێ یەکەم جاریش لەلایەن (جاحز) زاراوە (اصطلاح)بەکارهاتوە[2] .

---

[1] د عبدالوهاب المسیری —فی الخطاب والمصطلح الصهیونی ص24 ص29

[2] معجم مصطلحات الفکر الاسلامی المعاصر — فاتح سلیمان سنکاوی ص73

لەبنەچەدا (ئەنسیکلۆبیدیا)ووشەیەکی لاتینیە بەمانای (دائره المعارف) یان (پەروەردەی گشتی) ،یان وەك (الموسوعه العربیه)دەلیت(التعلیم الذی یشمل کل المعارف)[3] لە عربی بەماناو وەرگێڕانی جیاجیاهاتوە،لەشارستانی ئیسلامی بە(الحاوی)و(احصاء العلوم)،(حدیقة العلوم)،(کلیات)،(گولستان ) هاتوە.. ، لەسەردەمی نویش بە: المعلمة- دائرة المعارف – کنز-وعاء العلم-النون- معجم – قاموس ..،یەکەم جار بەترۆس بوستانی بە(کوثر)گوزارشی کرد، لەدوایدابۆ یەکەم جارابراهیم یازجی بە (موسوعە) ناوی بردو لەو زاراوەیە ئارامی گرت ،لەکوردی زیاتربە ئەنسیکلۆبیدیا ناودەبریت، هەلبەتە قاموس ومەوسوعە لێکجیان،لەکوردی قاموس(فەرهەنگ) هەیە بەلام کەمتر مەوسوعە وئەنسیکلیبۆدیای کوردی هەیە ، هەبوونی ئەو جۆرە ئەنسیکلۆبیدیایەی کوردی گوزارش لە بینای فیکری کوردی دەکا ،مادام بە ڕوانگەیەکی خۆمالیانە ئەو چەمکانە دەخویندرینەوەو ڕاستیش دەکرێنەوە ،واتە چەند پرۆسەیەکە لەیەك کاتدا: پیدانی زانیاری – بەراورد-هەلبژاردنی هەرەچاك-راستکردنەوەی بە ڕوانگەو تەراززوی خۆمالی –بیناکردنی زانیاریەك لەگەل هەردوو تەوەری مرۆڤایەتی وقۆناغی ئیستامان بگونجێ ..کەواتە بیناکردنی زانیاری میلەتەکەمانە ،لەو تەقەلایانە ئەوەی لێرە لەبەردەستانە مەوسوعەی جودی (بەشی دوەم )تەقەلایەکی پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنەیە .

2- دوای تویژینەوەیەکی زۆر دەردەکەوێ کارە نەرینیەکان زیاتر لە پیادەکردنە ،لە پەروەرانی ریبازەکەیە ،بە تایبەتی ئاینپەروەران ، هیچ دەقیکی ئاینی رەسەن نەرینی تیدا نیە ئەوە بەشەرە رەهەندی نەرینی تیدەخا لە ئەنجامی کارەکانی .

3-ئەوجارە وەك پیشوو رای مەدرەسەکانمان بە سەردیری جیا نەکردۆتەوە ...بەلکو لە رەوتی باسەکە بەرجەستەکراوە ،هەر بەگشتی ئەوجارە زیاتر هەولدراوە زانیاری تێدا کۆکەینەوە نەك ڕای تایبەتی، لە بەرگی یەکەم ئەو ڕەخنەیە لەلایەن ئەکادیمیەکان ئەوەبوو دەیان ووت زانیاری زۆری تێدایە بەلام ڕای تایبەتی زیاتر بەسەر زالە ,ئەوجارە ڕایەکەمان کەمێك کالّ کردەوە زانیاریمان بۆ زیاد کرد.

4-هەولمانداوە لەگەل هەر چەمکیك هەندی زاراوەی پەیوەستی لەگەل باس بکەین و لەتەنیشتی بە لیستیکی بچوك دەری خەین ،هەولی ئەوەشمان داوە زاراوەیەکی کوردی هاوتای بۆ بدۆزینەوە

---

[3] الموسوعة العربیةج17ص22

،هەرچەندە زەحمەتە مادام بزوتنەوەیەکی هزری وزانستی نەبێت لە کوردستان زاراوەی تایبەتی دروست نابێت دەبێت بۆی بتاشین ،بەلام جاریش وایە ئەسلیکی کوردی هەیە ،وەك ئەسترۆنۆمیا ،یان جاروایە هەندێ مەوسوعە ووشەکەی وەرگێڕاوە زۆر لە سەرچاوەکەی دوور کەوتۆتەوە ،لەوانە زاراوەی (البوردە) کە لە (موسوعە علم الاجتماع - فەرهەنگی ئۆکسفۆردە) هاتوە دەڵێ ووشەیەکی ئۆردیە بەمانای لیکجیاکردنەوەی ژن وپیاو لە خیزاندا ...دەبینین مەبەستی (پەردە)یە لەکوردی .

5-ئەو چەمك وزاراوانەی کیشەی لەسەرە کۆمەلیك پیناسی جیاجیامان بۆ هێناوە بەلام ئەوەی کیشەی لەسەر نەبێ هەریەك پیناسی گشتیمان بۆ کردوە .

سەرەڕای ئەو سەرچاوانەی ئاماژەی پیکراوە ،جاروایە هەندێ دەق لەکتیبەکانی بەندە وەرگیراوە ، لەجیاتی ئەوەی جاریکی تر خوینەر بنێرینەوە لای کتیبێکی ترمان وبە خوینەر بلّیی (بڕوانە فلانە کتیب) چەند دێرێکمان گواستۆتەوە بۆ ئاسانکاری .

(1)

## ئۆپۆزسیۆن Opposition المعارضة

**ئەوانەش دەگریتەوە( ریڤیژینیزم ،ئۆرۆشیوعی** ، سیستەمی دیارشی، ساتۆكراسی، **مجلس** قیادة الثورة ، دەوڵەتی پێكهاتە، **ناردۆ، ناردۆنیست**،...)

لە زمانەوانی ولەزەمینەی كوردەواری زیاتر بەوانە ووتراوە نارِازی(زیز،ناقایل، بەرهەلستكار، لامل ،..) كە لەگەل گەلەكۆ نەبوە ،بەوانەی هات وچۆی دیوخانی ئاغەیان نەكردوە ،بۆ ئەو خزمانەی میرەكان بۆ دەسەلاتیان ،چونكە ئەو كاتی ئەو جۆرە معارەزەیە تەنها لەنێو خۆیان دەگونجا .

لەو سەردەمە بەو حزب و تاقمانە دەووترێ ئۆپۆزیسۆن كە لە چوارچێوەی سیستەمی سیاسی وولات وەك (بەدیلی دەسەلات) بۆ حزب وتاقمی دەسەلاتدار دیموكراسیانەكار دەكەن ، هەندێكی تر زیاتر لەوە دەلێن ئەوانە ئۆپۆزیسۆنن كە تێدەكۆشن بۆ گەیشتن بەدەسەلات،واتە یان تەواوی دەسەلات رِەت دەكەنەوە یان بەشێكی[4]، هەندیكی تر پێیان وایە معارەزەیی لە نیو پەرلەمان دەست پیدەكا نەك لە نیو حكومەت یان جاروایە لە نیو حزبیك [5] ،هەشە پیچەوانە پێی وایە معارەزەبۆ حكومەتە چونكە حكومەت نوینەرایەتی گشتی ناكا بەلام پەرلەمان نوینەرایەتی گشتی دەكا ،سەرەرِای ئەوەش بەوفراكسیۆنانەش دەوترێ معارەزە كە بەشداری حكومەت نین، جاریش وایە معارەزە بوون دەكشێ بۆ نیو هەمو دام ودەزگا كۆمەلایەتی وزانستی و فكری و ئاینی و ..كەواتە بۆ دیاری كردنی معارەزەیی دەولەت دەبیت ئاوەلناوی سیاسیشی بۆ زیاد بكەی وبلێی (معارەزەی سیاسی) ئینگلیزیەكەی(poiti- Opposition )بە روسیەكەی(подавление оппозиции) ، بۆ جیاكردنەوە لە معارەزەیی زانستی وكۆمەلایەتی و فەرهەنگی وئابووری ..ئیستا ئەو سیستەمە كەسەرچاوەكەی

[4] الموسوعة السیاسیة – مادة: المعارضة ج6 ص231 .

[5] - Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts p 290

ڕۆژئاوایە بوویتە نمونەیەکی سەرکەوتو وسەرمەشق بۆ جیهان،بۆیە پیناسەکانی معارەزەی سیاسی تا ڕادەیەك لێك نزیکن ، با چەند پیناسیك هەلبژیرین :

+ لە ڕووی زمانەوانی لە بنەچەدا لە لاتینی هاتوە وئینگلیزیەکەی لە (ئۆپۆزیت- واتە پیچەوانەیی) هاتوە ، لە فەرهەنگە کۆنەکانی عربی معارەزەی سیاسی نەبوەو ئەو مانایەی ئیستای وەرنەگرتوە ، لە (لسان العرب) و(القاموس المحیط) (التعریفات)بة (..هی المقابلة علی سبیل الممانعة)[6] یان (الممانعة والمظاهرة والمكاشفة و..)هاتوە وەك زاراوەش بە ( .. عدم الموافقة على قرار سبق اتخاذه أو مناهضة اتجاه لاتخاذ قرار معين ) یان (..هي إنكار الرعية أو بعضها على سلطة الحكم ..) .

+لە یۆنانی کۆن لە مشت ومڕەکانی فلسفی بەوانە دەووترا ئۆپۆزیسۆن کەبەلگەیەکی پیچەوانەی بیرۆکەی بەرامبەریان هەبوە .

+پێناسی ئوسولیەکان کە لە(تعريفات الجرجاني) هاتوة: إقامة الدليل على خلاق ما أقام الدليل عليه الخصم .

+ پیناسی دەستوریەکەی بریتیە لەبەشداری نەکردنی حزبەکان لە حکومەت لە ئەنجامی دەنگ نەهێنان.

+ هەرچی پیناسی سیاسیەکەیتی ئەوا بە گشتی وا هاتوە (( تمكين الأفراد من معارضة الحكومة)) ، (( .. حد من التصرف للسلطان الحاكم المطلق )).لیرە پیناسی ئازادی بە معارەزە بوون بەستراوەتەوە

+قاموس المصطلحات السياسية: هەرتاقمێك بۆ ماوەیەکی دریژ لەگەل حکومەتەکەی لێکجیاوازبن بە ئۆپۆزیسۆن پۆلین دەکریّ ...ئەوە هەمان پیناسی (معجم المصطلحات الدبلوماسية والسياسية)یشە.

+المصطلحات السياسية الشائعة : يعني مصطلح (المعارضة) في السياسة في الاستعمال الأكثر عمومية أن أية جماعة أو مجموعة أفراد يختلفون مع الحكومة – على أساس ثابت وطويل الأمد عادة

---

[6] ابو الحسن الجرجانی – التعریفات ص121 .

+ معجم المصطلحات الدبلوماسية والسياسية : چەند جۆریکی معارەزەیی بە زاراوە لیکجیاکردۆتەوە وەك: ( یعترض بالفیتو-Oppose (to) by veto) (إذاعة المعارضة Opposition broadcasting ) (سیاسة المعارضة- Opposition policy ) (معارضی- Oppositionist ).

زیاتر لە بارەی معارەزە :

سەبارەت بە ئەزمونی یەکەم معارەزە بۆچوونی جیاجیا هەیە ،واپیدەچی یەکەم معارەزەیی شەیتان بووبێ بۆ دروست کردنی مرۆڤ پیشانیدا ،بەلام چ جۆرە معارەزەییەك ،لە ( قاموس الخرافات والاساطیر)دەلێت شەیتان دەسەلاتی لەزەوی وئاسمانەکان هەیەو معارەزەیە لەو پانتاییە فراوانە[7]، لەڕاستیەکەی ئاوانیە،خوای گەورە بەو دەسەلاتە موتلەقەی کەچی ئۆپۆزسیونی بۆ حوکمی خۆی داناوەو سیناریوی (شەیتان) ئەو رەهەندەیە، بۆ ئەوەی سیستەمی زەوجی لەوێش بێتە دی وتاقیکردنەوەکە ڕاستەقینە دەرچێ، ، خوای گەورە لە پەیامی خۆی باسی ئۆپۆزسیون و نارەزایەکانی دژ بەخۆی دەکات, لە کۆتاییدا ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾دەکاتە بنچینەی پەیوەندیەکانی، واتا توبزی نیە ،بواری هەیە ئۆپۆزسیون بن لەڕووەکانی عەقیدی و فکری و سیاسی و ئیداری....،کافر بوون تاوان نیە لەسەر زەوی، بەڵام هەر یەك لەو جۆرانە میکانزمی تایبەتی خۆی هەیە, لەبارەی (شەیتانیش)ئەو ئۆپۆزسیونێکی تەواوی حوکمی خودا لەو بوونەوەرە نیە, شەیتان توانای معارەزەیی نەك تەواوی کاری خوایی نیە تەنانەت بۆ گەردوون ویاساکانی سروشتیشی نیە تەنها بۆ کۆمەلگەیە.. دەسەلاتی شەیتان ئەوەندە فراوان نیە ، تەنها لەزەویەو لەوبەشەی مرۆڤ لێی ئازادی پێدراوە ، هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر یاسای سروشتی و روح و پەیامەوە نیە، شەیتان بۆ ئەو جۆرە بوونەوەرە نیە کەتاك ئیختیارن, مسەیەرن, کەتەواوی گەردوون دەگرێتەوە, بەڵکو شەیتان تەنها ئۆپۆزسیونی ئەو بەشەیە کە فرە ئیختیاریان لەبەردەمدا هەیە وەك ئادەمیزادو جن,بەکورتی شەیتان معارەزەی خودانیە بەلکو معارەزەی کارێکی خواییە لە بوونەوەریکیدا کە گەردوونە،لە گەردوونیش تەنها زەوی ،لەزەویش تەنها مرۆڤ ،لە مرۆڤیش لەو بەشەی مخەیەرە،لەو بەشە مرۆڤەش نیە کە باوەڕداری ڕاستەقینەیە، نەك وەك هەندێ مەزاهیب و ئاین وا تێگەیشتوون کە شەیتان رۆڵی ئۆپۆزسیونی سەرتاسەری دەبینێ بۆیە

[7] قاموس الخرافات والاساطیر-ص68 .

پێویسته حسابی بۆ بکریت، تەنانەت جار وایە بەجۆریك دەیکەنە خوای بەشێك لە بوونەوەر، سۆمەریەکان پێیان وابوە  خوای زەوی ناوی(ئەنکی) بوە و خوای ئاسمانیش(ئانۆ) بوە ،هەروەك لە ئاینی کۆنی عەجەم شێوەیەك لەوە هاتوە:(بعد النزاع والصلح بين اليزدان (الإله)والأهرمن إتفقا على أن يكون العالم السفلى خالصاً لأهرمن لمدة 7000ألاف السنة) ، ئاینی تاوی باوەڕی بەمهاریش هەیە وەك خاوەنی ئەو جیهانە[8]، هەرچی ئاینی ئیزیدیە(کتێبی جلیوە-بەشی یەکەم ودوەم) دەڵین خوای هەرەگەورە ئەو دنیایەی ئێمەی بە ملکە تاوس سپاردوە[9]، چەمکەکانی خوای خێرو خوای شەڕو هەموو ئەوانەی گوزارشتی جیاجیایان لە بوونی دەسەڵاتێکی موعارەزە بۆ خواوەند لەو بوونەوەرەکردوە هەڵەن،  کۆتایی پێ هێناوە بەوەی ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا....﴾واتە دوو جۆرە یاساو ڕێنمایی دەبوە هۆی بێسەرو بەری وگەندەڵی و تێك چوون .

بەگشتی معارەزە کۆنە مادام دوو ڕای جیا هەبووبێ معارەزەیی لیدروست بوە لەلای کەمدەسەلاتان بەرامبەر بالاکە ،لەهەمو ئاستیکدا ،بە پێی کتیبی (حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب) یەکەم جار چەمکی مافی مرۆڤ وئازادی وڕادەربڕین لای ئیمامی علی بەرجەستە بوە لە چوارچێوەی ئاینی ئیسلام (دعا الامام علي (ع) إلى أن ينعم الانسان بحق المساواة العادلة في ابعاده كافة سواء البعد الإنساني ، او الأجتماعي ، او الاقتصادي ، او السياسي ، او القضائي)[10]،هەتا بوونی معارەزەی سیاسیش( في حالة الاستبداد والظلم من قبل الحكام أزاء الأمة وتبديد حقوقها نتيجة ضعف الوعي والأداء السياسي والإداري ، فإن الامام يمنح الحق للامة بأفرادها ومجموعها بالتصدي للحكومة واخطائها تجسيداً لحق المعارضة وبصورة تدريجية حتى تصل الى الثورة المسلحة للقضاء على الظلم والطغيان وذلك استناداً الى مبدأ الأمر بالمعروف والنهي عن المنك)[11] ، هەندیك جەنگە ناوخۆییەکان بە معارەزە پۆلین دەکەن ،نەخێر ،معارەزەیی زیاتر مانای رازی نەبوونە بە دەسەلات بەلام نەگاتە ڕووبەڕووبوونەوەیوخوین رشتن ،بۆیە شەرەکانی سەفیەین و راپەرینەکانی تری شیعەو

---

[8]موسوعة الأديان مادة:مهاريشى .
[9] ئەنستاس ماری کەرمەلی – کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل63
[10] حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب ... ص 472
[11] حقوق ... ص201-و ص474

ئیمامەکان بە معارەزە هەژمارناکرێن ،هەندێ جار لەچوارچێوەی دەسەلاتی شیعەش معارەزە هەبوە[12] ، بەشیکی تر پێیان وایە لە سەردەمی نوێ ودەستوریدا ئەو حزبانەن کە زۆرایەتیان نەهیناوەو لە چوارچیوەی یاسایی کاری خۆیان لەدەرەوەی بەشداری حکومەت دەکەن ،نمونەی بریتانیای پی یەکەم بەرجەستەی ئۆپۆزیسۆنیە[13]،ئەوەش لە هەندێ پیشهاتی نوێی سیستەمی سیاسی بەریتانی دێت، هەریەکەم ئەزمونی پۆستی (سەرۆك وەزیران)دەگەڕێتەوە بۆ سالی 1721 کاتی (رۆبەرت والپۆل) لە بریتانیا ئەو پۆستەی پیدرا ،پیشوو تر پادشا خۆی رۆلی سەرۆك وەزیرانی دەبینی ، لە عوسمانی سەدری ئەعزەم کە لەسەردەمی ئۆرخان (1325-1359) خلیل جندرلی لە پۆستی وەزیری یەکەم ناوی سەدرولئەعزەمی درایە هەر خۆشی دامەزرینەری سیستەمی سەربازی ئینکشاریە بوو[14]، هەرچی (الموسوعە السیاسیە)پێی وایە معارەزەو معارەزەی سیاسی لێك جیایەو لەو سەردەمە مانای معارەزەیی هەیە ،بەدەقە عربیەکەی دەلێ: (المعارضة السياسة في الاستعمال الأكثر عمومية أن أية جماعة أو مجموعة أفراد يختلفون مع الحكومة – على أساس ثابت وطويل الأمد عادة .ويطبق المصطلح على نحو أكثر تحديدا على الأحزاب في المجلس النيابي التي تختلف مع الحكومة وترغب في الحلول محلها)[15].

سەرەتایی معارەزەیی بەو فۆرمەی ئیستا دەگەڕیتەوە بۆ سەرهەلدانی حزبی سیاسی ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی 18، یان دەکرێ بلێین ئەو سەردەمە بیری معارەزەیی حزبی هینا بەرهەم ، یەکەم جار حزب لە ئەوروپا سەری هەلّدا، لە سەرەتادا کۆمەلّە خەلّکێك یەك ڕا دەبوون بەرامبەر هەلّبژاردن و دوای لە پەرلەمان (فراکسیۆنی ڕای جیاجیای معارەزەیی ) دروست دەبوو.. بەپێی (احزاب السیاسیة- دۆڤرجە )مێژووی حزب بەو ترازەی ئێستای لەسالآنی 1850ز دەست پێدەکات، (موسوعة علم الاجتماع)یش هەمان مێژووی تۆمارکردووە و دەلّێ: ((هەتا سالّی 1850ز لەهیچ ولآتێك حزبایەتی لێ نەبووە بەو مانا و پێناسەی ئێستای حزب) نەبوە. ئەگینا

---

12 د رشيد الخيون -لاهوت السياسة ص20-

13 د احمد سعيفان - قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية: ص338

14 القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3ص588

15 الموسوعة السياسية– جمع واعداد: حصام قنديل.

دەستە و یانە و کۆبونەوە هەبوە،جار وایە هەندێ جم وجۆلی چاکسازی ئاینی وەك حزب دەردەکەوێ، لە ئیسلام شیعە لە مسیحی کالفنی یان پیۆریتانیەکان لە یەهودی ماسۆنی و دوایش زایۆنی ..، بەشێك لە مێژوونووسانی تر دیاردەکانی معارەزەیی و دژایەتی کردنی پادشاکانی ئەوروپایان وەك ماهیەت بە جۆرێك لەمعارەزەیی و حزبایەتی وەسف کردووە لە سەدەکانی (16) کە ناوی (وێگ) و (توری)یان لێ نراوە ، بەڵام بەو پەیکەر و زیندەگیە سیاسیە نەبووە، لە ئەمریکاش لەنیوەی سەدەی هەڤدەم (تۆماس جیفرسون) حزبی دیموکراسی -کۆماری دروست کردووە،(موسوعة العالمیة) باس لە جۆرە معارەزەیی وحزبایەتیەکی تر دەکاو دەڵێ: هەڵمەتەکانی ئەندرۆجاکسن بۆ سەرۆکایەتی لە 1828 لایەنگرانی ناویان لەخۆ نابوو دیموکراسیەکان بەڵام نەك شێوازی ئیستای حزبی ومعارەزەیی[1] ، پیش ئەو میژوە معارەزە بوون بەمانای جەنگو ناحەزی دەهات کەمتر بوار بەڕەخنەو بەرهەڵسکاری دراوە, ئەگەر هەشبوایە لە چوار چێوەیەکی سیستەمی ئۆپۆزسیۆنی نەبوو, هەرچەندە لە سەردەمی ئاینە راستەقینەکان رێگە بە ئۆپۆزسیۆنی فکری و ئیداریو سیاسیو ئاینیش دراوە, بەڵام ئاوا بەو مانایەی ئێستای لە سیستەمی دیموکراسی بەدی دەکرێت وانەبووە.

لەو ڕووەوە بەشیك پییان وایە پیغمبەرەکان (بەلایەن کەمەوە) لەسەرەتاوە لە شیوەی معارەزە هاتوون دژ بە گەندەڵی ونادادگەری لەوانە تویژینەوەیەکی( محمد إبراهیم محمد عبدالله-) بەناوی ( أحكام المعارضة السیاسیة المعاصرة بين الفقه والقانون) کەواتە دەکری بلێین محمد وباقی پیغمبەرانی تر لە معارەزەیی دەستیان پیکردوە ؟ معارەزەی چی ؟ سنوری جوگرافی و کۆمەلایەتی وسیاسی چی بوە ؟ئایا دوای گرتنە دەسەلاتیان بە هەمان شیوە بواریان بە معارەزەیی داوە؟ ئایا ئەوە لەگەل بنەمای (سمع وطاعة) (وأطيعوا الله ورسوله وأولی الأمر منکم)یەك دەگریتەوە؟ لەو کاتە معارەزە بوون ودەرچوون بوە لە ئاین؟یان جۆرە معارەزەییەکی تایبەت بوە ؟ بەشیك پێیان وایە معارەزە بوونی پیغمبەران وئاین وحوکمە سیۆکراتیەکان دەرچوون بوە لە ئاین وتەواوی سیستەمی سیاسیە کە ، نمونەشیان دەرچوونی فەرمانی کوشتن هەندی معارەزەی یەهودی وەك(کعب بن اشرف —سلام ابن ابی حقیق-ابن ستینە)لەلایەن پیغمبەرەوە(دخ) ...،بەو جۆرە ئەو بۆچوونە بویتە پاساو بۆ قەلاچۆی

---

[1] الموسوعه العربیه العالمیه —ج1 ص322

معارەزەو تەخوین کردنی هەتا دیموکراسیش دەلێن دیموکراسی ودیکتاتۆری وەك یەکە،لەدیکتاتۆری نابێت کەس قسەبکات لەدیکتاتۆریش هەمو قسەدەکەن (ئیفرات وتەفریتە) ،لەکاتێکا پێناچی دەرچوونی فەرمانی کوشتنی ئەوانە لەلایەن پیغمبەرەوە بە هۆی معارەزە بوون بووبیت واپیدەچی دەست تیکەل کردنیان بوو بێت لەگەل دوژمنانی دەرەکی وتەواوی سیستەمی سیاسی،سەرەڕای ئەوەش ئەو میژوانە پیداچوونەوەی دەوێت ،ئینجا مونافیقی گەورە (عبداللەابن سلول) نەکوژراو پاریزرا لەگەل ئەوەی پیغمبەر(دخ) دەیزانی ئەوانە چەندە معارەزەن ، لەبارەی بنەمای(طاعة)ش بە بنەمای(( لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) هەموارکراوەتەوەو بواری معارەزە بوونی ئاشتیانەی تیدایە ،بۆیە ئەوانەی بە موتلەقی دەلێن لە میژووی سیاسی ئاینی ڕێ بە معارەزە بوون نەدراوەتەواو ڕاست نیە ،لە هەندێ تویژینەوەی ئەکادیمی دەلێن زیاتر میژووی ئیسلام وەك ئیمپراتۆریەکان خوین ڕشتنی معارەزە بوەو یەکەم جاریش لە بارەی جینشینی پیغمبەر کەوتنە معارەزە، لەوەوە بەشیك پێیان وایە یەکەم معارەزەیی فەرمی وفراوان لە میژووی ئیسلام شیعە بوە ،دەلێن چونکە بە دیموکراسیانە نەبوە بۆیە تا ئیستاش ئەو کێشەیە بەردەوامە، بەگشتی وادەردەکەوێ معارەزەیی پەسند نەبوە ،چونکە ناوناتۆرەی فقهیان بۆ داتاشیە ، زیاتر زاراوەی (فرقة)و (تایفة)یان بۆ بەکارهێناون : الفرقة: وهو الخروج عن الجماعة بمعيار الحق الاعتقادي، الطائفة: وهو الخروج عن الجماعة بمعيار الأمر العملي. بمعنى: أن الفرقة: هي خروج عقيدي، والطائفة: خروج عملي.

ماوە بلێین لە ناو نەتەوە یەکگرتوەکان جۆرە سیستەمێك پەیڕەو دەکرێ بە ناوی ڤیتۆ(حق النقض)

لاتینیە بە مانای (قایل نیم)، جاران (ئەنجومەنی موحەلفین) لە دادگاکان ئەو مافەیان هەبووە بەناوی (ڤیتۆ) بەکاریان هێناوە بۆ معارەزەی هەندێ حوکمی دادگایی و پرسی تێهەلچوونەوە، بەلام بۆ ئیستا ئەو مافە معارەزەییە بۆ هەر بڕیاریکی ئەنجومەنی ئاسایشە بەپیێ ی مادەی (27) لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەتە بۆ 5 وولاتی گەورەی جیهانی (ئەمریکا، بریتانیا، فرنسا، ڕوسیا، چین) ،بەلام ئەوە بە معارەزەیی پۆلین ناکرێت بەلکو بە ئیمتیاز هەژماردەکرێت .

<u>پاساوی سیستەمی معارەزەیی:</u>

بەگشتی جاران وتا ئیستاش  هەندێ تیبینی لەسەر دیموکراسی و سەرخانەکانی هەیە ، لە ئیئتلاف و فرەحزبی و سیستەمی معارەزەیی..، پێیان وایە پڕ لە قەیرانە ، لە(5) بنەماکانی شیوعیەت سێیەمیان واهاتوە (تاك حزبی و نەبوونی معارەزە)، لای هەندێ زانای رۆژئاوایش بەجۆریك معارەزە ئەرێنی نیە ، لای هۆبز تاڕادەیەك ریگرتنە لە ئازادی کاری دەولەت ،نزیکە لەوەی لایەنگری لە دەسەلاتی ڕەها بکا نەك ئۆپۆزیسۆنی ، پێی وانیە یاسا لە چوارچێوەی پەرلەمانی و معارەزەیی دەرچێت ،بەلکو پێی وایە یاسا لەلایەن کەس ودەسەلاتی  ڕەها دەربچێ باشە، دەلێ: ئازادی بەگشتی بۆ مرۆڤ ودروستکراوی تر  ئەوەیە کە هیچ کاریگەریەکی دەرەکی ڕێگر نەبێت،معارەزەی نەبیت[17]، نمونەکەی نزیکە لە وەسفی (من دەولەتم ودەولەتیش من)ی لویسی چواردەم( 1643-1715) ،هەندی چەمك وزاراوەی تر بەرامبەر بوونی ئازادی ئۆپۆزیسیۆنی هەیە لەوانە  زاراوەی(ساتۆکراسی) بە مانای هەمو چالاکیەك بۆ دەولەت (سەرتاپای) هەموی لە پیناو دەولەت ، کە زیاتر بەرجەستەی سیاسەتی فەرمی حزبە فاشی وهاوتاکانی بوە ،وەك لە ووتارەکەی مۆسۆلینی لە28ئۆکتۆبەر1926 میلانۆ ووتی هیچ چالاکیەك دژ بەدەولەت قەبوول نیە ،ئەوەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی فاشیەتی مۆسۆلینی[18]،زیاترئۆپۆزیسۆن بەپیلان وکریگرتەیی وەسف کراوە،بەهەمان ئارستەلە (مەو سوعەیەکی حزبی بەعس)پیی وایە معارەزە کریگرتەیەو ئەرکی ئەوەیە:(کۆمەلەوحزبی بیردەرەکین —گەلالە ئابوریە برجوازیەکان-هاندانی فەرهەنگ ونەریتی دەرەکی —دژایەتی کەلتوری عربی) دوای بەوە ناوەستی دەلێ: حکومەت خۆی تشریعەو تنفیزەو قەزاشە باوەڕی بە لیکجیاکردنەوەی دەسەلاتەکان نیەجیگەی معارەزە هەر نابیتەوە[19]،لەسەردەمی حوکمی شیوعیە کانیش توند تر بوو، معارەزە بوون تاوان بوە هەروەك ستالین ترۆتسکی بەوە توومەت بارکرد لە (م س)و دەرکرا ئەو مەنتوقەی بۆ ئامادەکرا :(ینبغي إبعاد تروتسكي إلى خارج البلاد  لأنه يتبنى أيديولوجية معارضة تتسع صفوفها

---

[17] توماس هوبز- اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص216، ص505

[18] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية   ص201

[19] تعريفات ببعض المصطلحات —مكتب الثقافة والاعلام ص56  ،   ص160

[19] القاموس السياسي —احمدعطية اللة  ط3 ص1146  .

يومًا بعد يوم)[21]، ئەوانەی معارەزەی ستالین بوون بە ناوی پیلانگێڕی وبەفیتی حکومەتی ئەلمانیای نازی وهتلەر دژ بە ستالین وەسف دەکران، هەریەکە لە ترۆتسکی وزینۆفیف وکامینیۆف وریکۆف وبۆخارین و لە 1936-1937 فەرمانی تیربارانیان بۆ دەرچوو بەهۆی معارەزە بوونیان لەدادگای مۆسکۆ[22]. هەتا زانای وەك (ئەندرێ ساخارۆف)چونکە معارەزە بوو لە ئاوەدانی دوور خرابۆوە بە توومەتی بێ عەقڵی ،دوای لەسەردەمی بیرۆسترۆیکاو گلاسنۆست گەڕایەوە ، ئەو جۆرە دەولەتانەی پێیان ووتراوە ساتۆکراسی، وەك لە رۆژهەلاتیش دوا دەسەلاتی عوسمانی پێناسی ئیتحادو الترقی ئەوەبوو هەمو عوسمانی لەدەست ئیتحادو تەرەقی بوو ،ئەویش لە دەست مرکزعام بوو ،(مرکزعام)یش لەدەست انورپاشا بوو ،ئەو جۆرە دیزاینە بوە سیستەمی حزبە دیکتاتۆرو سەرکردەکان تائەو دواییەش ،لە ئەلمانیای نازی وفاشی ئیتالیا دەولەت لە ژێر فەرمانی حزبێك بووە، حزبیش لە ژێر فەرمانی کۆمیتەیەك بوە ،ئەویش لەدەست تاکە کەسێك بووە بە ناوی (ڤۆهر — رابەر ) ،دەولەتی عیراقی لەدەست خزبی بەعس بوو ،ئەویش لە ژێر دەستی (مجلس قیادە الپورە)بوو ،ئەویش لەدەست سەدام حسین بوو .

بە هەمان بۆچون پاپای کنێسەی قپتی پێی وایە دەشێ معارەزە بۆ سیستەمی سیاسی هەبێت بەلام ناشێت بۆ کنیسە هەبێت مادام لەسەر یەك گیانی کار دەکا، دەقەکەی واهاتوە (رأینا في حیاتنا الکنیسة أن البعض باسم الدفاع عن (الدیمقراطیة)، ینادون بوجوب وجود (جبهة معارضة)، في الکنیسة.. فهل یتفق هذا مع روح الکنیسة ووحدتها، قد توجد (معارضة) في بعض التنظیمات السیاسة أو التشریعیة. أما الکنیسة فتقوم علي نظام (الروح الواحد)[22]، لەفتوای زۆر فەقیهی ئیسلامیش ئەو بۆچوونە بۆ دەسەلات هاتوە تا ڕادەی حرام کردن ،بۆیە لەدوای (راشدین) زۆربەی

---

[20] لیون تروتسکي -تاریخ الثورة الروسیة ت: اکرم دیري ج1ص4

[22] کتاب خبرات في الحیاة للبابا شنودة الثالث ( المعارضة في الکنیسة) .

پانتایی میژووی خەلافەتی ئیسلامی معارەزە بوونی کەمتر پێوە دیاربوە ، گەلێ جاریش خوێنیان ڕشتراوە بەناوی دەرچوون لە ئاین ودەرچوون لە فەرمانی خودا هەژمارکراوەو زانای ئاینیش فتوای بۆداون،لەوەش خراتر جاروایە فتوایان بۆدراوە خەلك وکەس وکاری خۆیان بکوژن نەوەك دوای ببنە معارەزە – مندالیشی گرتۆتەوە ، دەتوانین بڵێین یەکەم ئەزمونی معارەزەی سەردەم لە میژووی خەلافەت لە ئەزمونی عوسمانی لاو دەست پیدەکا، لە نێو ڕەوشەنبیرە (تەغریبیەکان)ڕایەکی واپەیدابووکەچارەسەری دەردەکانی عوسمانی (کەبەپیاوە نەخۆشەکە ناوزەد دەکرا)[**] بریتیە لە لاسایکردنەوەی ڕۆژئاوا ، تا لە1865ز بوە بزوتنەوەی عوسمانی لاو دروست بوو لەسەر دەستی نامق پاشاو ئایەتولابەك ، دوای سالێك ئەنجومەنی نیشتمانی بەناوی (مەبعوسان)ودوای 23/12/ 1876 دەستوریشیان راگەیاند، بەو شێوە سیستەمی سیاسی عوسمانی شێوەیەکی رۆژئاوایی لە دیزاینی معارەزەیی ودەسەلاتی وەرگرت (سولتان مراد) پێش سوڵتانیەتی وەك یەکێ لە بنەماڵەی سوڵتان لەگەل ئەو بزوتنەوەیە بوو،چەندین سەرچاوەی تر باس لەوە دەکەن کە زۆربەی کۆبوونەوە نهینیەکانی (تورکیای لاو دژ بە عوسمانی )لە مالی صباح الدینی برازای سولتان عبدالحمید کراوە لە پاریس[23] ،بەلام بەخێرایی ئەو بزوتنەوەیە وەرچەرخا بۆ پیلان و ناوی نرا تورکیای لاو(جوان تورك)، لەسەر ترازی بزوتنەوەی کاربوناری ئیتالی کە لە سالی1807بە مەبەستی دروستکردنی دەولەتێکی نەتەوەیی بۆ نابۆلی ئیتالی سەری هەلدا، ئەو ناوەش هاوشێوەو لاسایی بەریتانیای لاو، ئیتالیای لاو، ئەلمانیای لاو..هتد، بەو مانایەی دەولەتێکی تازە لەسەر بنچینەی تورکی دروست بکرێ،، دوای لەیادی 100سالەی شورشی فەڕەنسا ولە 14/7/ 1889 ئیتحاد تەرەقی لێجارڕداعوسمانی کەوتە قۆناغیکی مەترسیدار، دەتوانین بلێین عوسمانی لاو چاکسازی تەواوی عوسمانی بوولەشێوەی معارەزەیی ، بەڵام تورکیای لاو ئینقلاب بوو بەسەر عوسمانی بۆ تورکیایەکی نوێ هەروەك ڕوویدا لە1908 لەسەر دەستی ئیتیحادوتەرەقی ، دوایش لە بزوتنەوەکەی کەمالی کۆتایی بەعوسمانی هێنرا ،ئەو ئەزمونە تائیستاش کاریگەری سەلبی ماوە وەك پیلان سەیری معارەزە دەکرێت بەتایبەتی لای بزوتنەوە ئیسلامیەکان ، لەهەمان کاتدا بوە هۆی قۆستنەوەی لەلایەن عەلمانی

---

[**]ـ یەکەم جار نیکولا قەیسەری ڕوسیا ناوی دەولەتە نەخۆشەکەی لە عوسمانی نا.

[23] مذکرات جمال باشا ج1 ص430 .

دەسەلاتداران ،بۆیە لەدوای ڕووخانی خەلافەتی عوسمانی عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی کەمتر معارەزەی سیاسی ئیسلامی قەبوول بوەبەتایبەتی وولاتانی عربی،تا ئەو سەردەمەش وەك بینرا لە جزائر لەتاجیکستان و تورکیاوشوێنی تر لە کۆتای سەدەی بیستەم ، دوای لەمیسروتۆنس و بەحرەین وشوینی تر دووبارە بوویەوە ،لە ئێرانیش کە کۆماریکی ئیسلامیە کەچی لەویش کەمتر معارەزەیی قەبوولە بەو سیستەمەی هاوچەرخ ، ...

ئەوە وای کردبوو لەڕووی سایکۆلۆجیەوەجەماوەری ئیسلامی لە سەرەتا کەمتر باوەڕی بەبەشداری کردنی حکومەت و سیستەمی معارەزەیی هەبو ،ئەزمونی حزب السلامە لە تورکیا لە هەلبژاردنی 1973 گەیاندیە 48 کورسی چوە ناو ئیئتلافێك لەگە(پارتی گەل)، لەهەلبژاردنی1977ژمارەی کورسیەکانە بۆ 24 کورسی کەمی کردا[24] .

هەرچی رۆژئاوایە بە بێدوودلی بەرەو سیستەمی معارەزەیی بەڕێکەوتن ، ئەگەر ڕای هۆبزو هاوتاکانی ئەوە بێت وەك لەسەروو باس کرا ،ڕای تۆماس ئەکوینی وکانت ومۆنتیسیکۆو تادەگاتە فۆلتیرو رۆسۆ وگیزۆوهاوتاکانی لەبارەی سیستەمی سیاسی وجێبوونەوەی معارەزە پیچەوانە بوە ،گیزۆ کتیبیکی بەناوی(فی الوسائل الحكم والمعارضة السياسية فی حالة الراهنة لفرنسا) لەسالی 1821 نوسی، تیایدا رەوشەنبیری دەسەلاتی بەستەوە بە بوونی معارەزە و بینینی ڕۆلی فراوان لە سەر ئاستی چینە نوێکانی کۆمەلایەتیش[25]، نمونەکانی پیشکەوتنی ئەوروپاو شکستی شیوعیەت و ناشرینی ئەو جۆرە ڕژێمانەو ڕژێمەکانی نازی وفاشی و بەعسی و تۆرانی و..زیاتر ڕووی ئاڕستەی تاك حزبی ونەبوونی معارەزەی لاواز کرد،هەرچی پاساوی تیۆری بنچینەیی معارەزە بوون هەر لە پیچەوانەی نمونەکانی سەروو دێت ،لە ڕیسایەك کە لەلایەن (رۆبیرت مایكل) لە 1912 دارژرا دەلیٚ: لە دەسەلاتە ستاتیکیەکان ئەگەر دەست گۆڕی دەسەلات و دیموکراسی معارەزەیی نەبێت ئەوا بەرەبەرە دەسەلاتی مەدەنی ومیلی بۆ دەولەت قۆرخ دەکرێت،لەویش بۆ حکومەت ،بەڕەوتی سروشتی بەرە بەرە لە حوکمی زۆرایەتی وبۆ کەمایەتی ،لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك ،لە چەند کەسێك بۆ

---

[24] رجب طيب اردوغان –قصة الزعيم –تأليف حسين بسلي ،ت:دطارق عبداللة ص50

[25] معجم المؤلفات السياسية ص675-

تاكه كەس ،ئەو ڕێسایە پێی ووتراوە (قانون اقليه الحديدى)[26] ، له (موسوعه الميسره) ناوى ناوه (القانون الحديدى للاوليكاركيه-iron law of oligarchy) دەلى بە سروشتى بەشەرى كارەكان لە بەكۆمەلەوە بەرەو كەمايەتى ولەويش بۆ تاكه كەس دەچێت[27]،لەوەوە فلسفەى دەست گۆڕى دەسەلات و بوونى معارەزەيى هاتتە كايەوە ، ئيستا بەشێكە لە تەواوكارى دەولەتى مۆدێرن .

زياتر لەوەش له هەندى وولات خۆيان وادەكەن معارەزە دروست بيت بۆ تەواوكردنى سيستەمى ديموكراسى ,نمونەى سەنگافورە (لى كوان)دەلیٚ دواى ئەوەى لە قەيرانەكان وقۆناغى گواستنەوە دەرچووين خۆمان حەزمان كردله هەلبژاردنى 1984دوو كورسى بدۆڕێنينه (جيرنتام ئەميندارى گشتى پارتى ديموكراتى سەنگافورە)[28] .

**ئۆپۆزسيون وئاين له رژێمه ديكتاتۆريەكان** رژێمه ديكتاتۆريه جياجياكان نازناوى جياجياش بۆ ئۆپۆزسيون دەتاشن, هەندیٚ جاريش راسته ئۆپۆزسيونێكى دروست كراو يان پشتگيرى كراو پەيدا دەبێت. بەگشتى له سيستەمى حوكمڕانى شوعيەتى پێشوو (چ وەك دەولّەت چ وەك حزب) معارەزە له سەر فەرهەنگى ئيمپرياليزمى و چينى برجوازى پۆلين دەكرێ و كراوە, بۆيه تۆمەتى وەك :كرێگرتەو رجعى وخۆفرۆش و قۆلى پينجەم و.. ئامادە بووە بۆيان, خۆشيان كەمتر ئامادە بوون معارەزەيى ئاشتى بن ،لەو ڕوەوە شيوعيەكانى ئەوروپاى(ئۆرۆ شيوعى) رۆژئاوا به جۆريكى تايبەت كاريان دەكرد،دەبوونەمعارەزەى ديموكراسيانەبەلام لەلايەن هەندى تەيارى ماركسى بەلادەرو (ريڤيژ ينيست)ناوزەد دەكران ، بەتايبەتى لەلايەن هەندى تەيارى ماركسى توند ، تەنانەت هەنديكيان باوەڕيان نەك بە معارەزە بوون نەبوە بەلكو هەرچى شارستانى سەرمايەدارى بوە دژى بووينە، يەك لەو پينج بنەمايانەى شيوعيەت بريتى بوە لە وەرچەرخانى سەرمايەدارى بۆ شيوعيەت له رێى شۆڕش وتوندوتيژى(نەك ئاشتىو ديموكراسى وشيوەى معارەزەيى) ، باكۆنين بە (ئەناركى -

---

Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts 226-p [26]

[27] موسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية-جزء(ق) ص32.

[28] لى كوان- من العالم الثالث ال الاول ص171

فەوزەوی)هەژماردەکری لە مارکس زیاتر دژی بوو نی دەولەت ومولکیەت و(تەنانەت دژی سیستەمی دیموکراسیش بوون) ،لایەنگری تیرۆر وخوین ڕشتن بوو لە پیناو هینانەدی سۆشیالیستی خاوەنی دروشمی (تحطیم كل ماهو واقع خیر)[29]، ئەنارکیش لای زۆربەیان جۆریکە لەدەسەلات[30] ،یان پیشەکیەکە بۆ دەسەلاتی (ئیدارە التوحش)[31] یان (فوضی الخلاقة).

لەرژیمە دکتاتۆریەکانی تری (حزب القائد)دیسان تۆمەتی جیاجیایان بۆ داتاشراوە, ناچار ئۆپۆزسیون بەدەر لە دیموکراسی پەنای بۆ چەکدار یان راپەرینی سەرتاسەری بردووە. پاساویکی تری هەندی لە سیستەمی سیاسی تر ئەوەیە کە لەکاتی قەیران وقۆناغی گواستنەوە معارەزە زیان بەخشە ، جۆلیاس نایریری سەرۆکی تەنزانیا لە کتیبەکەی(حكم الحزب الواحد) زیاتر جەخت لەو دۆخەسیاسیە دەکاو دەلیّ لەکاتی قەیراندا دەبیّ معارەزە یەکسەر بچیتە ژیر باری دەسەلات، لە جەنگە جیهانیەکان وولاتانی هەرە دیموکراسی ئەوروپا وای کردوە، لەکاتی سەرهەلدانی قەیرانی (واترگیت) لە ئەمریکاو دەست لەکارکیشانەوەی (نیکسۆن) رۆبرت دال پیشنیاری کرد یان حکومەتیکی پیکهاتوو لە هەردوو حزبی(کۆماری ودیموکراسی)دروست بکریت ،یان بیلایەنیك سەرۆك بیّت وپۆستەکان لە نیو هەردوو حزب بە یەکسانی دابە شبکات[32].

بەشیکی تر لە زانایان پیّیان وایە نەك معارەزە بوون تەنانەت دیموکراسیش بۆ وولاتانی جیهانی سیّیەم (بە تایبەتی عربی) هەر نابیّت ، لیناردۆ بایندەرلە کتیبی( National Integration and Political Devlopment)دەلیّت دروست کردنی یەکیتی نیشتمانی لەووولاتانە پیویستی بە یەکخستنی کۆدەنگی فەرهەنگی وئایدیۆلۆجی سەرتاسەری هەیە ، سامۆئیل هندگتۆنیش هەروا دەلیت ومەرجی عەلمانی بوونیشی بۆ زیاد دەکات زۆربەشیان نمونەی وولاتانی عربی دەهیّننەوە .

---

[29] القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3 ص177 ص890

[30] الموسوعة لالاند الفلسفية ج1 ص484

[31] کتیبی (ادارە اتوحش ) ئەلەکترۆنیە وا مەزەننە دەبردریّ نەزەریەی سیاسی داعش بیت.

[32] ارنت ليبهارت–الديمقراطية التوافقية فى مجتمع المتعدد ص52–53

له میژووی ئیسلامیش لەدوای خەلافەتی راشدین لە سەردەمی ئەمەوی معارەزە تووشی زیندانی وئەشکەنجە دەبیت ونامینیت تا سیستەمی عربی ئیستا، بەشی زۆری فقهی ئاینی وبەتایبەتی (تیاری سلفی نا جهادی)معارەزەیان پی حرام ودەرچوونە لە ملکەچی بۆ (ولی ئەمر)،فتوای زۆر توند دراوە دژی معارەزە ،تەنانەت جاروایە فتوای ئاینی دراوە بۆ کوشتنی کەسانێك کە مەزەندەکراوە لە ئایندەیەکی دوور ببنە معارەزە ،تەنانەت فتوا دراوە برای خەلیفەکان بکوژریٚ نەوەك ببنە معارەزە ،لەوانەلە سەردەمی (محمدفاتیح)ئەو فتوایە دراوە دەقەکەی (هەر کیمە نە ئەولاد مدن میسراولا،قرەندا چلرلینی نیزامی،عالم ئیگینی قتل ئیتمك مناسبدەر ئەکسەری علمادخی تەجویز ئیتمچدەر،ئەنونلە عامل ئۆلەکر- واتە :مادام کوشتنی برایەکان خزمەتی رژیمی گشتی دەکات دشیٚ بەو کارە هەلسی بە پیٚی زۆربەی زانایان)[33] ،پالپشت بەو فتوایانەسەرنج بدە ئەو کارەساتانە: قتل بايزيد الأول (1389-1403) أخاه الأصغر وابنه فى سبيل ذلك، ومحمد الأول (1403-1421) قتل أخوته الأربعة، ومراد الثاني (1421-1451) قتل أخاه وعمه، ومحمد الثاني (1450-1411) قتل أخاه الرضيع، وسليم باوز (1512-1520) قتل خمسة من أولاد أخوانه وأخوين، وسليمان القانوني (1520-1566) قتل بعض أولاده وبعض أحفاده بدسيسة زوجته، ومراد الثالث (1574-1595) قتل اخوانه الخمسة، ومحمد الثالث (1596-1603) قتل (19) أخا له خنقا قبل دفن أبيه، وعثمان الثاني (1618-1622) قتل أخاه.. وبعضهم خلع وقتل...[34]

جارجاریش بڕیاڕی سیاسی وسەربازی وای ویستوە دژی ئایەتی(لا اكراه)یش بن ،ئەو تۆبزیە کراوە بەناوی ئاین ،لەسالی 1891سولتان عبدالحمید نامەیەکی هەرەشەی بۆ ئیزیدیەکان نارد داوای لیکردن یان ئیسلام بن یان جەنگ ،بەلام پاساوەکەی سولتان ئەوەبوو ئەوە تۆبزی و(اكراه)نیە بەلکو

[33] عبدالعزیز شناوی –الدولة العثمانیة دولة اسلامیة مفتری علیها ج1ص349 هەروەها د محمدالبرواری –الکورد والدوله العپمانیه ص122

[34] الدولة العلية العثمانية- ص777

ئەوانە لە بنچینەدا ئیسلام بووینە دوای هەلگەڕاینەوە،دوای سوپای بەسەرکردایەتی (عمر وهبی)ناردو دەردی دانی[35] .

بەشیکی زۆر لەزانایان پێیان وایە پەیوەندی دەسەلات وهاوولاتی ئەوەیە ئەگەر کاری دەسەلات چاك بوو ئەوا پاداشی خواییان دەبیٚ وهاوولاتیش دەبیٚ سوپاسیان بکەن ،ئەگەر خراپەشیان کرد ئەوا دەبیٚ هاوولاتی ئۆقرە بگریت بۆ رۆژی دوای ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري :ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة) ، گەلیٚ جاری تر ڕێك بە پێچەوانەی ئاینی ئەسل (هەر بەناوی ئاینەوە) کاری خراپ کراوە،ئاین بۆ دژی زولم هاتوە چ بەدەست چ بە زمان چ بەدل کە گوزارشی ڕاستەقینەی قۆناغەکانی معارەزەیەبۆ هەمو دۆخێك ، کەچی بەکاریان هیناوە بۆ مل کەچی مەزلوم لە قازانجی زالم، قەشە ئۆگستین دەیوت هەژاروبەندەقەدەری خودایە نابی خۆ رزگار بکەن وئەو قەدەرە تیك بدەن ،نابی بەرگری ومعارەزەیی بکەن ، ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملكوت الله) دەلیٚ (بۆیە خواعەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەکی معارەزەیی بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا[36]، ابن عبد ربه هەمان بۆچوون بەناوی ئاینی ئیسلام دووبارە دەکاتەوەو دەلیٚ: اذاكان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)[37] ، ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەکاو دەلیَ(أن السلطان ظل الله في الأرض)[38] زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەکان ووتراوە 60 سال لە سولتانیکی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بیٚ سولتان بین ،بۆیە دژایەتی ومعارەزەکردنی دەسەلاتی حرام کردوە وداوای کردوە ملکەچی وئۆقرە باشترە لە بەرگری وفتنە ،لە ڕاستیدا ئەو بۆچونە فقهیانەی ئیسلام کەمتر جێی لەدەق دەبێتەوە ،بەلام ئەوانەی مسیحی جیکەوتی لە دەق هەیە وەك: .. أَجَابَ يَسُوعُ :مَمْلَكَتِي لَيْسَتْ مِنْ هذَا الْعَالَمِ. لَوْ كَانَتْ مَمْلَكَتِي مِنْ هذَا الْعَالَمِ، لَكَانَ خُدَّامِي يُجَاهِدُونَ لِكَيْ لاَ أُسَلَّمَ إِلَى

---

[35] السياسات الاثنية فى العراق ص86-87

[36] ماركسية قرن عشرين ص146

[37] د محمد شحرور-الكتاب والقران ص101

[38] مجموع الفتاوى ج28/290-291

الْيَهُودِ. وَلكِنِ الآنَ لَيْسَتْ مَمْلَكَتِي مِنْ هُنَا[39]،هەرلەوە رۆسۆ دەلێت ئاینی مسیحی تەنها باسی ئاسمانە باسی کیشەی زەوی تێدانیە ،دەشلێ بۆدروست کردنی کۆمەلگەیەکی بێدەنگ واچاکە هەموی مسیحی بن[40] ،لة شوینیَکی تری ئینجیل هاتوة:( فلا تهتموا للغد.لأن الغد يهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره ..) [41] ، ( سمعتم انه قيل: عين بعين وسن بسن، أما أنا فأقول لكم: لا تقاوموا من يسيئ إليكم . من لطمك عن خدك الأيمن فحول له الآخر، ومن أراد أن يخاصمك ليأخذ ثوبك، فاترك له رداءك أيضاً))[42]، لیرەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدين افيون الشعوب) لەلای مارکس هات وبارون دولباخ وزانای تر هات،هەرلەوەشەوە تومەتی جیاجیا ڕووبەڕووی ئاین بوویتەوە ،بە نامعارەزەیی وملکەچ کردن ، ئەگەر معارەزەکەشی زیاد بووبێ بە (تیرۆر)(ئوسولی) ناوزەد کراوە .

لە سەردەمی نویش لە نیو سیستەمی فەرمانڕەوایی عربی (کە بەشیکیان خۆیان بە دریژکراوەی ئاینی هەژماردەکەن) شیخ عبدالسلام یاسین گەورە زانای ئاینی مەغریب بەنامەیەك بۆ پادشای مغریب (حسنی دوەم)بە ناونیشانی (ئیسلام یان تۆفان)هەندی رەخنەو ئامۆژگاری شیوە معارەزەییەکی پیشان دابوو بوە هۆی زیندانی تا 3سال.

ئەگەر سەرنجیکی ئەکادیمیانە بدەیتە گۆڕینی ناوەڕۆکی ئەو بنەمایە کۆمەلگەی نەفامی ( انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً .فقال ... يا رسول الله :أنصره إذا كان مظلوماً، أفرأيت اذاكان ظالماً كيف أنصره؟ قال :تحجزه – أو تمنع من الظلم، فإن ذلك نصره) دەبینی پیغمبەر( د خ) بناغەیەکی معارەزەیی بۆ هەلەو زۆرداری بە ئاشتیانە دارشتوە ، بە ڕوونی بەشی دوەم مانای معارەزە دەدات بە شیوەی ئاینی خۆی ، وەك دەقیش کە ریسای بەناوبانگی (امر بالمعروف ونهى عن المنكر)ی لیهاتتە دی، لەوەوە

---

[39] كتاب المقدس- إنجيل يوحنا 18: 36

[40] روسو – فی عقدالاجتماعی ص208

[41] -إنجيل متى 6: 34).

جان جاك روسو-فی العقد الأجتماعی –ترجمة:زوقان قرقوط، دار القلم –بيروت ص208 (ونقله لكتاب المذكوربصيغة: وطن المسيحی ليس في هذا الدنيا) .

[42] - الكتاب المقدس العهد الجديد- متى 5 (39 – 41) كتاب المقدس-العهد الجديد مت(34:6)

هەمو هاولاتیەك بواری معارەزە بوونی بۆ هەیە لە چوارچیوەی ئەو ریسایە، زیاتر لەوەش وەك ئەرك دەردەکەوی ،بەلام وەك ئەزمونی خەلافەتی ئیسلامی کەمتر بوار دراوە ئەو ریسایە کیانی سیاسی لی بخەملی ، لەویَ معارەزە بوون مانای دوژمنایەتی داوە بۆیە سەر پەلدان ڕەوایی وەرگرتوە ،جاروایە خراتر هارِوونە ڕشید داوای یارمەتی لە شارلمان دەکرد دژ بە معارەزەکانی خۆی لە ئەندەلوس ،تارادەیەك نێوانی سولتان سەلیمی سێیەم ولویسی شازدەمی فرنسی و لەو دواییەش سولتان محمود دژ بە معارەزەکانی خۆی (محمدعلی پاشا لە میسرو میری سۆران لەکوردستان )داوای لە بالمرستۆنی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا کرد بەهانای بیت دوای داوای لە ڕوسیاش کرد[43]،ئیتر وای لیدەهات زانای ئاینی تەواو لەسیاسەتیش دوور دەکەوتەوە، هەر بۆیەش ئەدەبیاتی سیاسی لە فقهدا زۆر کەمە ،چ جای ئەدەبیات لە بارەی معارەزەی مەدەنی .

**موعارەزەودیموکراسی:** فلسفەی ئۆپۆزیسۆن لە ژیانی دیموکراسی لە چەمکی دەسەلاتی میلی سەرچاوە دەگریَ ،واتە ڕیشەی دەگەڕیتەوە بۆ تیگەیشتنی دیموکراتی جۆری ئەسینی ، بەو مانایەی هەمو میلەت لەحکومەت بەرێوەبردن بەشدار نین، هەر ناشگونجێت وەك رۆسۆ دەلی دیموکراسی ئەسینی جیبەجیَ ناکریَ ...رۆبۆت دالیش دەلیَ لەناو هەرکۆمەلیك ژمارەیان لە 10000زیاتر بیت ،مەحالە لە 50000 جیبەجی بکریت[44] ، رۆبیرت ماکیفریش دەلی ئەوەی راستیە ئەزمونی دیموکراسی یۆنانی حوکمی ئەرستۆکراسی بوو نەك دیموکراسی بەهۆی ئەوەی شمولی کۆمەلیك چینی نەدەکرد[45]،لەکاتێکا پەرلەمان نوینەری هەمو خەلکە ،واتە ناکریَ معارەزەی پەرلەمان بێت بەلکو دەبێت معارەزەی حکومەت بیت بۆ ئەوەی نوینەرایەتی ئەوانە بکەی کە لە حکومەت نوینەریان نیەو بەو بەرنامەوکارنامەیە رازی نین ،سەرەڕای ئەوەش معارەزە بوون لە دیموکراتیدا پیگەی تریشی هەیە ، لە دیموکراسیدا (زەمینە)هەیەو (نیشانە)هەیە. زەمینەکەی بریتیە لە جیاکردنەوەی هەرسیَ دەسەلاّت (پەرلەمان, دادگا, حکومەت)و سەروەری یاسا ،هەرچی نیشانەکانیەتی بریتیە لە: شەفافیەت وئازادی بیروراو مافی یاسایی معارەزەو سەروەری ، هەلّبژاردن، دەست گۆری دەسەلاّت

---

[43] بۆ ئەو سەربردەیە بڕوانە : مانسفیلد – تاریخ الشرق الاوسط ص81 وص101

[44] موسوعە علم الاجتماع -مادة : دیمقراطیة

[45] رۆبیرت ماکیفر-تکوین الدولە ص221 .

,... كەواتە بوونی ئۆپۆزسیون لە چوار چیوەی دەوڵەتی یاساو سیستەمی سیاسی وولاتە، یەکێك لە نیشانە بنەرەتیەکانی دیموکراسیە, جاریش وایە پیٚ دەڵێن ئۆپۆزسیونی سیاسی, بۆ ئەوەی لە ئۆپۆزسیون یاخی (واتا بەدەر لە دەوڵەت)جیابکرێتەوە, کە هەوڵی گۆرینی دەسەلاّت دەدات بەدەر لە ئامرازە دیموکراسیەکانی وولاّت, عادەتەن ئەوجۆرە ئۆپۆزسیونە لە وولاّتانی دیکتاتۆر سەر هەلٚ دەداو دەبێتە شۆڕش و ڕاپەرین, کەمتر لە وولاّتانی دیموکراسی سەر هەڵدەدات، معارەزە لە وولاتانی دیموکراسی بەشدارە لەدام ودەزگای دەولەت تەنها لە کابینەی حکومەت بەشدار نیە ،هەرچی لە وولاتانی دیکتاتۆریە معارەزە بیبەش دەبیت لەتەواوی دام ودەزگای دەولەت ، ئەو کاتە معارەزە پەنا بۆ ئامرازیکی گۆڕینە دەبابە چەکداریشەوە ، ئەوە وەك کاری خواییە کە معارەزە و مولحیدانیش بەشدارن لە نیعمەتی ئەو گەردونەو یاساکانی سروشت بەلام بەشدارنابن لە پاداش.

هەندیٚ وولاّتی دیموکراسی وەك (بەریتانیاو فەرانساو ئیسپانیاو.....) وا دێتە پێش چاو جۆرە ئۆپۆزسیونێکی چەکداریان دژ هەبیٚ لە هەرێمەکانی ئیرلەندا, کۆریسکا, باسك..... بەلاّم ئەوە ئۆپۆزسیون نیە, بەڵکو کێشەی نەتەوەییە کە هەموو جار مەرج نیە بە سیستەمی دیموکراسی چارەسەر کرابێت.

لە وولاّتانی دیموکراسی بەوانە دەوترێت (ئۆپۆزسیون) دەنگ و کورسی لە پەرلەمان هێناوە بەلاّم بەشداری حوکومەت نیە, مەرجیش نیە دەنگی کەم هێنابێت, جاری وایە کورسیشی زۆرە بەلاّم نەیتوانیوە هاوپەیمان پەیدا بکا ،بەلکو بەرامبەرەکانی توانیویانە ئیئتلافێك دروست بکەن، ئاستی یاسایی تەواو کردووە بۆ حوکومەت پێك هێنان, ئەو کاتە بە ئۆپۆزسیونی دەمێنێتەوە, ئەگەری ئەوە هەیە ئەو ئیئتلافە تێك چێت دیزاینی دەسەلاّت و ئۆپۆزسیون بگۆرێت, ئۆپۆزسیون بچێتە جێی دەسەلاّت و حیزبەکانی دەسەلاّت (یان هەندێکیان )ببنە ئۆپۆزسیون, واتا نەئۆپۆزسیون و نەحوکمداری هەتا هەتا نیە, خێرا خێرا دەست گۆری دەسەلاّت دەکەن و دەبێتە هۆی چالاّك بوونی حوکومەت لە خزمەت گوزاریوو کەمکردنەوەی گەندەڵی و زیاد بوونی شەفافیەت و لە ناو بردنی قۆرخی دەسەلاّت و خزم خزمێنی و.... زۆر دەردی تر لەناو دەبات, مادام معارەزە مافی چاودیری دەسەلاتی دەبیت، بەلاّم بیٚ بنیاتیش نیە وەك لە دوای تۆماری دەکەین.

**ئۆپۆزسیون له سیستەمی تەوافوقی (دەولّەتی پێکهاتە):**

جۆرێك لەو نمونەیە لە کۆتایی دەسەلاتی عوسمانی بەدی دەکرێت ،لەسەردەمی ئیتحادوتەرەقی ولەهەلبژاردنی مەبعوسان(پەرلەمانی عوسمانی دوای 1908) سەرجەم 143ئەندام بۆ تورك بوو 130 ئەندام بۆ غەیرە تورك بوو[46] ،نێوانی تورك وغەیرە تورك لە نێو عوسمانی بۆیەکەم جار وەرچەرخا بۆ نەتەوەو پێکهاتەی سەردەست وئەوانی تر بندەست ،وەك پەیوەندی (ناردۆ) و (ناردۆ نیست) لە دەستوری یۆگوسلافیا لەسالانی 1945 ، بە مانای (ناردۆ) میلەتە گەورەکەی دەسەلات وەك سرب لە یۆگوسلافیاو روس لە یەکیتی سۆفیەت ..ناردۆنیست نەتەوەکانی ترن وەك ئەلبان وبۆسنی لە یۆگوسلافیا[47] ،بەلام ئەو دوو ئەزمونە بە سیستەمی سازان تێنەپەڕین ئۆپۆزیسۆن بوونیەکانیان بوە کارەسات .

لە سیستەمی تەوافقی(سازان) پەیوەندی ئۆپۆزسیون بە حوکومەت و دەولّەت بە تەواوی دەگۆرێت, لە ڕاستیدا هەر نامێنێت, لە کاتی ئێستادا ئەو وولاّتانەی پەیرەوی ئەو سیستەمە دەکەن وەك عێراق, لبنان و ئیمارات (پێشوتر قوبرس و جیکۆو سلۆڤاکیا)، ئەو جۆرە دەولەتانە لە پۆلی دەولەتی پێکهاتەن(مركبة-etat-compos) دەژمیررێن، ئەو دەولەتانەی لە یەك رەگەزی و مەرکەزیانە پێك هاتوون پێیان دەلێّن دەولەتی سادە : etat-simple . بادوو نمونەی عیراق وقوبرس وەرگرین :نەخشەی کۆمەلاّیەتی عیراق (55٪ شیعە و22٪ کورد و22٪ سونە[48] 3٪ کەمایەتی- بوە 102٪ هۆیەکەی ئەوەیە هەندی شیعەی کوردیش هەیە لەسەر هەردوو ڕێژەیە بۆیە زیاد دەکات)، هەرچی

---

[46] أمين سعيد- الثورة العربية الكبرى -ج1، القاهرة: مكتبة مدبولي، 1999، ص10 -11.

[47] معهد السلام الامريكي (حل النزاعات بين الاديان) —مركز التعليم والتدريب-2008 ص 99

[48]ـ لە زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان ئەگەر باسی سونەو کوردکرابێ ئەوە ووتویەتی کورد زیاتر بوە ، بۆ ئەو مەبەستە با بەلگەنامەیەکی بریتانی بەکار بهێنین چونکە لای سونیشیان گرتوە:

*CO 730/ 161/2* سكان كردستان: ينكر الكرد بكونهم اقلية في العراق لأن عدد السنة العرب ليس اكثر من الكرد ولكن اعتبارهم مع الشيعة فقط كعرب يعطي لهم الاكثرية. واذا اجريت احصاء دقيق ولم يحسب الكرد ضمن عرب السنة يكون عدد الكرد والعرب متساويا.فمثلا تم تجاهل عدد الكرد في لواء ديالى ذات الاغلبية الكردية والاقضية الكردية في كوت في الاحصاءات السابقة.

قورسە تەنها لە (20٪)ی موسوڵمانی تورکن کەمایەتیەکی عەرەب و مەسیحی بە ڕەچەڵەك ماڕۆنی لوبنانیشی تێدایە و (80٪) ی ڕەچەڵەك یۆنانین،بە بنەمای (تەوافوق) لە دەستووری1959 تۆماریان کرد کە سەرۆك بۆ یۆنانیەکان و جێگر تورك، پەرلەمانیش پێکبیت لە (50) ئەندام، 35 لە یۆنانی و 15 لەتورك و 7 وەزیری یونانی و 3 وەزیری تورك، سوپاش لە 60٪ یۆنانی و 40٪ ، ئەو جۆرە پیك هاتنە پێی دەووتری (تەوافوق) ، یەکەم سەرکۆمار هەڵبژێردرا بەپێشبڕکێ لە نێوان ( مکاریۆس ) و ( جۆن کلیۆدۆس ) ، قەشە مکاریۆس بووە سەرکۆمار بەئامادەبوونی هەرسێ لا (تورکیا-یۆنان-بریتانیا) و (فازل کوتچوك )ی تورك بووە جێگری،هەمو ئەوانە حوکمەتی بێ ئۆپۆزسیونن, چونکە سیستەمەی تەوافقی بۆ دەوڵەتی پێکهاتەیە, تەوافقیش لە نێوان پێکهاتەکانە بە پێی ڕێژەی بوونیان, هەر هەڵبژاردنێکیش لە سەرتاسەری وولات ناکرێت بەڵکو بە (کۆتا) کورسیەکان دیاری دەکرێ بۆ هەر پێکهاتەیەك (کە دیموکراسی تەوافقی ناوزەد دەکرێت) ئینجا حزب و قەوارەی هەر پێکهاتەیەك منافەسە لە سەر ئەو کورسیانە دەکەن, هەر خودی تەوافقیش بەواتای ئەوە دێت کە نابێت رەچاوی زۆرینەو کەمینەی سەرەنجامی هەڵبژاردنی دیموکراسی بکرێت, بەڵکو رەچاوی قایل بوونی نوێنەرانی (دەرچووی)پێکهاتەکانی دەکرێ. براوەکان لەگەڵ پێکهاتەکانی تر حوکومەت دروست دەکەن, پەنا نابەنە بەر ئیئتلافی بۆ تەواو کردنی (نەساب), هەموو دەرچووەکانی پێویستە, کەس نامێنێتەوە لە دەرەوەی حوکومەت, تەنها ئەوانە نەبێت کە دەنگیان نەهێناوە, ئەوانەش پێناسی ئۆپۆزسیونی نایانگرێتەوە, بۆیە لەسەرو ووترا ئۆپۆزسیون نامێنێ لە سیستەمی تەوافقی.

لەو ڕیسایە (کوردستانی عیراق) دەردەچێ دەبینین لە ناو عیراقیکی تەوافوقیە کەچی معارەزەی لی سەرهەلدا بۆیە هەلوەستەیەکی تایبەتی لەسەر دەکەین لەبارەی جۆری معارەزەیی کوردستان وهۆکاری سەرهەلدانی .

<u>ئۆپۆزیسۆن وخەباتی رزگاری نیشتمانی</u>: پرسیاری بنچینەیی لەو بەشەیە ئەوەیە بۆچی خەباتی رزگاری و مافی میلەتان بە ئۆپۆزیسۆنی نایەتەدی ؟ ئایا بۆ کوردستان دەگونجا ئەو جۆرە خەباتە بکا بۆ هێنانەدی مافی چارەنوس؟یان ڕاستەوخۆ تر خەباتی معارەزەیی دەبێتە بەدیلی خەباتی نیشتمانی ؟

یەك وەلاممان بۆ ئەو پرسە نیە ،ئەو وولاتانەی تەواو دیموكراس ومەدەنی و دەولەتی یاسان جیایە لەگەل وولاتانێكی دیكتاتۆرو ناشیۆنالیزمی ،لەوەی یەكەم یەكێ لە ئەگەرو بژارەكان دكرێت هەم خەباتی ئاشتی هەم خەباتی ئۆپۆزیسۆنی ئەنجام بدا بۆ هێنانەدی مافی میلەتێك ، بۆ دوەم هەرگیز ناكرێت ،هۆكارەكەشی بەكورتی ئەوەیە : لە باش ترین دۆخیداخەباتی معارەزەیی گوزارش لە وولاتێكی دەولەتی هاوولاتی بوون دەكا،كەچی خەباتی نیشتمانی گوزارش لە دەولەتیكی پیكهاتەدەكا ، واتە ئەو میلەتە كیشەی هاوولاتی بوونی ڕەنگە نەبێت كیشەی میلەتی هەبێت ،

لەسەر ئەو بنچینە پەیوەندی كورد و كوردستان بەعێراق هاولاتی بـوون نیـە، بـەلكو گەلـە، دیسـان دەكرێ چەند گەلێك لەناویەك دەولـەت بـژین ئەگـەر ئـەو دەولەتانـەی پرانسـێپی (هـاولاتی بـوون) لەدەستورو دام و دەزگاكان بەردجەستە بكـات كەچـی ئـەو دەولاتانـەی كوردیـان بەسـەر دابەشـكرا بەئاڕاستەیەكی ڕەگەزی و تایفی دەولەتیان پێك هێنا، بۆیـە بەكسـانی و هـاولاتی بـوون نەهاتـەدی بەلكو هاولاتی پلەیەك و پلـە دوو..تـا گەیشـتە ڕادەی تـەعریبی ڕێكخراو..لـە وولاتـانی ئـەوروپا وجیهانی مەدەنیەت وا ڕێكەوتوە چەند پیكهاتەو نەتەوەیەك لەیەك دەولەت بووینـە، بـەهۆی ئـەوەی دەسەلاتەكە هەولی ئەوەی نەداوە نەتەوە بچـوكەكە لـەناو گەورەكـە بتوێنیتـەوە بـەلكو هەولیـداوە هەمویان لە دەولەت بتوێنیتەوەو سیستەمی هاولاتیبوونی لێبەرپا بكـا ،ئەوانـە كیشـەی نەتـەوەیی وكەمایەتی نەما ،كەچی وولاتانی وەك عیراق وتوركیا هەولیان داوە كـورد لـە نێـو عـەرەب وتـورك بتوێننەوە ،بۆیە خەباتی معارەزەیی لەوەها وولاتێك ناكرێت پیویستی بەخەباتی نیشتمانی هەیە .

**ئۆپۆزسیون لە كوردستان:** سیستەمی سیاسی كوردستان زۆر دگمەنە تا ئەو ساتەی لە هەندێ باردا ئاستی دەولەتی هەیە, لە هەندێ باری تر دەگەرێتەوە بۆ ناوچەیەكی ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی تەنها خاوەن حوكومەت, ئاوا ئاساییە لە ئەزموونی جیهان هەیە هەرێمێك حوكومەت و ئۆپۆزسیونی هەبێ, بەلاّم ئەوەی كوردستان زیادەیەكی لە سیستەمی سیاسیەكەی هەیە, ئەوەیە هەم سیستەمی توافقی و هەم (سیستەمی دیارشی)ی بۆ زیادكراوە, تیایدا پێگەی ئۆپۆزسیون زۆر بەرتەسك دەبێتەوە, بەتایبەتی تر لە كوردستانیش لە قۆناغی گواستنەوەیە, قۆناغی رزگاری نشتمانی.

له سیتەمی تەوافقی وەك لەسەروو باس كرا جێی ئۆپۆزسیۆن نامێنیٚ چ جای ئەوەی دەولەتیش نیە, چونكە ئۆپۆزسیون لە هەموو شوێنێك لە دەوڵەت بەشدارە بەلاٚم لەحوكومەت بەشدار نیە, كەچی لە كوردستان دەولەتی نیە.. ئەی كەواتە كوا مەرجەعی بەیەك گەیاندنی حوكومەت و ئۆپۆزسیون؟ هیچ دەربازێكی یاسایی بۆ ئەو پرسیارە نیە جگە لەوەی بەدیل بۆ دەولەت بدۆزینەوە, ئەویش (سەروكایەتی هەرێمە), كەواتە دەبیٚ ئۆپۆزسیون لە سەرۆكایەتی هەرێم بەشدار بێت و لە حوكومەت بەشدار نەبێت, كەچی لەمادەی (1)ی یاسایی سەروكایەتی هەرێم رێگرە لەو هەنگاوەكە بە سەرۆكی هەرە بالای تەنفیزی وەسفی دەكات , وا پێدەچێت دام و دەزگای یاسایی و سیاسی و ئیداری كوردستان لە ئەنجامی نەخشەو پلانەوە نەهاتبیٚ, رووداوەكان هێناویانە ئاراوە,.. بۆیە حسابێك بۆ پێگەی سیاسی و ئیداری و یاسایی ئۆپۆزسیون نەكراوە, ئێستا ئۆپۆزسیونی كوردستان نەك لە كابینەی حوكومەت بەڵكو سەرۆكایەتی هەرێم و لە باقی دام و دەزگاكانی بیٚ بەش كراوە, بۆیە لە قەیرانی بەردەوامن تا ئەو كیشەیە چارەسەر نەبی .

(2)

## بەهاری عەرەبی ربیع العربی Arab Spring

ئەوانەش دەگریتەوە (بوهاری ئەوروپی- بوهاری گەلان –بوهاری پراگ-منگلق ومدی، شۆرشی یاسمین ،تیۆری سارتۆری‌بۆ گواستنەوە لە تاکحزبی بۆ فرەیی، سایکس بپیکۆی دوەم..)

ئەو زاراوەیەیە لەگەڵ ڕاپەرین وشۆرشی میللەتانی عەرەبی لە دژی دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆری عەرەب سەری هەڵدا لە سەرەتای سالی 2011، دوای پەڕیەوە بۆ زۆربەی وولاتانی عرب بە خیرایی بۆیە زاراوەی بوهاری عەرەبی لێنرا ،کە لە بنەچەدا ئەو زاراوە لەسەر ئاوازو دیمەنی چەند بوهاریکی ڕاپەڕینی تر هاتوە ، یەکەم جاریش بە کاریگەریەکانی شۆرشی فرنسی 1789 ووترا بوهاری ئۆروپی کاتی چەندین وولاتی تری ئەوروپی شیوەی فرنسی ڕووبەڕووی ڕاپەڕین بوونەوەو بەتایبەتی لە نێوان.(1838 تا 1848)دوای شاو مەلکانی ئەوروپی هاوپەیمانیەکیان پیکهێنا دژ بەو بوهارە ،دوای جاریکی تر بوهاری میلەتانی ئەوروپا سەری هەلدا لە دروست کردنی دەولەتان ، لەوانە رزگاری گەلی نەمسا ، موسوعەی بریتانی بەدریژی باسی ئەو زنجیرە شۆڕش وڕاپەڕینانە کردوە کە لەسالی 1848 گەیشتە ترۆك و لە دژ پادشایەتی ،یەکەم جار لە سقلیە دەستی پێکرد چوە فرنساو ئەلمانیاو ئیتالیاو ئیمپراپرۆریەتی نەمساو زۆرلای تر لە زۆربەشیان شکستی هێنا ،لە فرنسا جاریکی تر سەرکەوتو بوو بوە هۆی هاتنی کۆماری دوەم ودەرگای گۆڕانکاری بۆ ئەلمانیاو ئیتالیاش کراوەئەگەرچی هەر بە سیستەمی مەلەکی مانەوە[49] ،بە پێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار ناوی بوهاری ئەو ڕووداوانە لە نێوان ( 1848 – 1849 )لە ئەوروپا هات بە ناوی (بوهاری گەلان) کە لەکاتی وەرزی بوهار ئەو ڕووداوانە دەستی پێدەکرد،دوای لە نیوان(1859-1861)ئیتالیا دروست بوو لەسەر دەستی کافور ،لە 1871 ئەلمانیا دروست بوو لەسەر دەستی بسمارك [50]، پیشوو تریش

---

[49] Encyclopædia Britannica -Article: 1848, Revolutions

[50] پیشوو تریش فریدریکی دوەم ئەو تەقەلایەی دابووبۆیە بەشیك ئەوە بە یەکخەرەوەی ئەلمانیا وەسف دەکەن .

ئەو وولاتانە لە ژێردەستی عوسمانی دەرچوون : مەجەر لە 1774 وسربیا لە 1870، رومانیالە 1878، یونان لە 1882، بلغاریا لە1908..ئیتر زاراوەی (بوهاری گەلان)یش سەری هەلدا ، جاریکی تر لە سالی 1968 میلەتی چیکوسلۆڤاکیا لەحزبی شیوعی راپەرین بە تایبەتی شاری پراگ ، دوای هیزی سۆڤیەتی و وارشۆ هاتن و دەسەلاتی حزبیان گێڕایەوەو ئەو پرۆسەیە بە (بوهاری پراگ) ناوبانگی رۆیشت، لەو کاتیەوە هەر جم وجۆلیکی میلی وپان وبەرین یەك لەدوای یەك بکریت زیاتر پیی دەووترێ (بوهار-ربیع) ، لەسالی 1990 ئۆروپای رۆژهەلاتی لە دژی سیستەمی شیوعیەت ڕاپەڕین و زاراوەی (بوهار) گەش بۆیەوە ، هەمو ئەوانە بوونە بنچینەی زاراوەی (بوهاری عەرەبی).

لەسەرەتا چەند ناوی تری هەلگرت ئەو کاتەی ڕاپەڕینەکە تەنها لە تۆنس بوو وەك ناوی (شۆڕشی یاسمین) بەو مانایەی شۆڕشیکی سپی وخوین رشتنی تیدانەبوو لەشیوەی شۆرشەکانی سۆڤیەتی پیشوو و جۆرجیا وئۆکرانیاو بەناوی شۆرشی گول وشۆرشی پرتقالی و نیلی وزۆری تر ،بەلام دوای ئەوەی پەڕیەوە زاراوەی بوهاری عربی بەسەر زاراوەکانی تر زال بوو .

<u>زنجیرەی ڕوداوەکانی بوهاری عربی :</u>

دەمێك بوو چاودیران چاوەڕێی ئەو ڕاپەڕینانە بوون لە نێو ولاتانی عربی بەهۆی دیکتاتۆریەت گەندەلی ودواکەوتن وبیکەفائەتی هەلبژاردنی ساختەی دەسەلاتدارانیان ،پیشوو تر گۆڕانکاری لە چوارچیوەی ئینقلابی عسکری وسەروو بوو ،ئەو جارە لەخواروو ولەسەر دەستی جەماوەر هاتە دی ، بە دروشمی (الشعب یریداسقاط النظام) دەست کرا بە ڕاپەڕین و بوهاری عربی .

بە پێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار باراك ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکا ناوی لەو ڕاپەڕین وشۆڕشانەی عربی بە (بوهاری عربی)ناوزەد کرد،بەشێکی تر دەلێن یەکەم جار(هیلاری کلینتۆن)ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئەو زاراوەیەی بەکارهێنا، لەبیرمان نەچێت هەندێك لە ناشیۆنالیزمە عەرەبەکان وەسفی تریان کردوە ،(صلاح مختار) لە تویژینەوەیەکی بەناوی (متلازمة امریکا –هل هو ربیع العربی ام سایکس بیکو الثانیة)دەلێ ئەوەسایکس پیکۆی دوەم ودابەشی زیاتری عەرەبە ،پیناسی

جیاجیای نیە چونکە زاراوەیەکی فکری نیە ،بەڵکو وەسفی هەیە وەك لە( موسوعەی معرفە) وا وەسف وپێناسی بوهاری عربی دەکا:_هو اصطلاح شاع استخدامه منذ مطلع عام 2011م ويعني تلك الثورات والاحتجاجات السلمية التي قامت ضد الفساد والظلم والاستبداد واندلعت لتنادي بإسقاط النظام القائم والتي انطلقت منذ أن أشعلتها نار المواطن التونسي شهيد الكرامة محمد البو عزيزي في جمهورية تونس وأسقطت رئيسها زين العابدين بن علي ، ثم في جمهورية مصرالعربية وأسقطت أيضا رئيسها حسني مبارك كما أسقط الليبيون نظام معمر القذافي في ليبيا ، واندلعت كذلك في اليمن وسورية والبحرين وغيرها .

زۆربەی جار هەر بزوتنەوەیەکی جەماوەری دژبە دەسەلاتدارانی عەرەبی سەری هەلدابێت یەکسەر توومەتی (کرێگرتەی زایۆنی وئیستعمار)بۆیان ئامادە بوەو ئیتر قامچی وشمشێریان بۆ بەرزدەکرایەوە ،ئەوجارە بوار نەبوو ئەو تومەتە بهۆننەوە ،ڕاگەیاندن وفەیس بووك ڕۆلی گرنگیان لە ئیدارەی بوهاری عربی و ڕاپەڕینەکان بینی ،هەم ڕۆلیشیان لەوە بینی کەدەزگای ڕاگەیاندنی دەسەلاتەکان نەتوانن ناوەڕۆکی ڕاپەڕینەکان چەواشە بکەن ،بۆیە ڕووداوەکان وبەهاری عربی بە خێرایی تەنیەوە ،یەکەم گلپەی ئەو بەهارە لە تۆنس سەری هەلدا کاتێك لە رۆژی هەینی 2010/12/17 محمد بۆعزیز (خاوەن عارەبانەکی دەستگێڕی هەژار)لە ڕکی دام ودەزگای ئاسایشی (زين العابدين بن على)ی تۆنس ئاگری لەخۆی وعارەبانەکەی بەردا و دنیای هەژاند، بووە هۆی سەرهەلدانی ڕاپەڕین و شۆرش لە دژی رژێمی تونس تێکیان رووخاند سەرۆك کۆمار هەلاتە سعودیە,دەلێن بن علی باوەڕی نەدەکرد ئەوە شۆڕش وڕاپەڕینە ڕوو لەوە بۆیە بە تۆبزیش سواری فڕۆکە نەدەبوو بۆهەلاتن تا خێزانەکەی (لەیلا)لێی قیڕاندو ووتی سواربە هەی هێڕە ئەوە هەمو ژیانی خۆم لەسەر گێلی تۆ سەرف کرد[51]،دوای سەرکەوتن ودەرکردنی سەرۆك بۆ سعودیە ، نۆرەی جزائر هات لە 28/دیسمبر/2010 بە خۆپیشاندان ونارەزایی،ئەنجامیکی وای نەبوو ،لە مانگی یەنایەری سالی 2011 بوهاری عربی گەیشتە ترۆکی و پەڕیەوە بۆزۆر وولاتی عربی ،لە 12/ینایەر/2011 گەیشتە لبنان بەجۆری خۆی و کاریگەری تایبەتی خۆی هەبوو بوە قەیران وتائیستاش بێسەرۆکن،لە 14/ینایر/2011 گەیشتە ئوردەن ،لە

---

[51] ستيف كراووتشو- حركات الثورية(قصص شعوب غيرت مصيرها) ص13

17/ینایر/2011 بۆ مۆریتانیا،له 17/ینایر/2011 بۆ سودان،له 21/ینایر/201 گەیشته عومان،زۆربەی ئەوانه هەندێ چاکسازیان کردو هەندیکیش هیزی بەکار هێنا ئەنجامیکی گەورەی نەبوو ،له 25/ینایر/2011 گەیشته میسر زۆر بەتوندی و کارگەیشته ئەوەی سەرۆکی میسر (محمدحسنی مبارك)لادرا لەدەسەلات **که بەشۆڕشی 25ی ینایر ناوزەد دەکرێت** ،له 20/فبرایەر/2011 بەجۆری خۆی گەیشته عیراق ، تارادەیەکیش لەو بەرواره گەیشته کوردستان یان ووردتر له 17ی شوبات ،بۆ بەحرەین 14/فبرایەر/2011 وتائیستا له قەیرانی تایفیدایه، ئەوجا گەیشته لیبیا له 17/فبرایەر/2011 ورووداویکی زۆر ڕوویدا بوه هۆی هاتنی هیزی هاوپەیمانان وکەوتن وکوژرانی معمر قەزافی ،بۆ سوریاش له 15/مارس/2011 له خۆپیشاندانەوه وەرچەرخا بۆ بەرگری چەکداری و ڕووداوی ناخۆش تا ئیستا بەردەوامەو ..وەسفیك هەلدەگرێ که بلێی بوهاری عربی له قوراوی شام پەکی کەوتوه .

<u>**سەربردەی دەسەڵاتە دیکتاتۆریه عەرەبیەکان:**</u> بەشێکی زۆر واتێگەیشتوون که وولاّتانی عەرەبی درێژکراوەی حوکومی ئومەوی و عەباسین, کەچی ئەوە زۆر دووره له راستی, بەڵکو میللەتانی عەرەب له ژێر داگیرکاری فره ڕەگەزو فرە ئیمبراتۆر و ئیستعاربووینه, عەرەب میللەتێکی زۆر بون کەچی دەسەڵاتیان زۆر لاواز بوو، له نێو عوسمانی نەدەگەیشته ئاستی چەرکەس و کوردو ئەرنائووت وهەندی جار مەمالیکیش، ئینجا له نێو ویلایەتەکانی عەرەبیش کەمتر وەك کورد خاوەنی میرنشین و دەسەڵاتی خۆجێیی بووینه، چەندین سەدە بوو هەر ژێر دەسته بون، عبدالرحمن بەزازدەڵێت لەوەتەی سالی 1258ز وه عەرەب ژێر دەستەو بێ دەوڵەت ودەسەلاّت بون[52]، فۆرستەر دەڵێ: 7 سەدە عەرەب ژێر دەسته بون[53] ،زیاتر لەوانەش سکرتیری عوسبه (مسیۆ پۆلتس) به بۆنەی رزگاری عیراقو وەرگیرانی له (عصبة الامم) له ڕۆژی 3/تشرینی یەکەم/1932 وتی: ئەوه چەندین سەدەیه عەرەب ژێر دەسته بوه بۆ یەکەم جار بتوانن سەروەریەکانیان بەدەرخەنەوە.

---

[52] العراق من الاحتلال الى الاستقلال ص30
[53]ـ بروانە: فورستر- نشأة الدولة العراقية ص49

چەندین ڕێکەوتن و هاوپەیمانی لەگەل شێخەکانی کەنداو بەمەبەستی دروستکردنی کیانی سیاسی بێنرخ بەپێی ستانداردی بەریتانیا هاتە مۆر کردن، لەوانە : ڕێکەوتنی قەتیف کە 26 دیسمبر 1915ز، بەریتانیاو (قواسمەکان) لە 6/فبرایر/1806، دووەم لە11 /ینایر/1820 لەگەل شیخەکانی (رأس الخیمة، ابوظبی، بحرین، عجمان، ام القیوین، ..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە1892..[54]، پیشوو تریش لەسالی 1737ز بە سەرپەرشتی بەریتانی ڕێکەوتنامەیەکی نێوان (حمدی کوری ئال سعود و ئیمام محمد بن عبدالوهاب) کرد[55]، لە میسرسش ڕێکەوتنی وا لە 19 ینایر و 10 یولیو/1899گرێدرابوو، لە سالی 1915ش ڕێکەوتنی شریف لەگەلّ ماکماهۆنی بەریتانی مۆرکرا، بوە هۆی سەرکەوتنی گەورەی بەریتانیا بەسەر خیلافەتی عوسمانی، زۆربەی ئەو شیخانە لەژێر سایەی عوسمانی بون، بەلاّم لە ژێرەوە موچەیان لە بەریتانیا هەبو، یەکەم جار گۆڤارێکی بە هێزی ئەو سەردەم بەناوی (شؤون خارجیة) کە لەندەن دەردەچو لەمانگی 1927/1ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسکریت) لیستێکی لە ناوی ئەمیروشێخ وکەسایەتی عەرەبی تێدا بلاّوکرایەوەلەگەل مووچەکانیان بە نهێنی: (1 ـ ابن السعود 100.000 جنیە، 2 ـ ملك حسین ـ شریف مکة ـ 100.000 جنیە، 3 ـ فهد الهذال 140.000 ربیة، السید الأدریسي12.000 لیرة..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژیەی بۆ بەریتانیا دەیکەن [56]، زیاترو تایبەتی تریش ڕوی لە بنەماڵەی مەلیك فەیسەل بو، بە نهێنی لەدوای دروستکردنی ئەو دام و دەزگایانە بەریتانیا بڕیاری دا لە پاداشی ئەو هەمو چاکەیەی بنەماڵەی (الشریف حسین بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە 1916 قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس رۆیشت، لەو

---

[54]ـ دەقی ڕێکەوتنەکان لەکتێبی ایران والخلیج العربی ص42- زۆربەشیان بەپەنجە مۆریان کرد خوێندەواریان نەبوو.
[55]ـ د.صالح العابد –حرکة الأستقلال العربی، رسالة الماجستر –جامعة المستنصریة، بغداد1988 ص12-13
[56] عبدالرزاق الحسنی - تأریخ الوزارات العراقیة -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92 ئـەو تەقەلایـە لەطـەل شیخ محمود درا وەری نەطرت.

پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی   شافەیسەلیان بە (وسام النصر) و (صلیب الحرب مع النحل) خەلاَت کرد[57]، ئەوکاتی هەر ولاَتێك بۆ سەرۆك یان مەلیکێکی عەرەبی دیاری بکرابایە دەبوایە پالَپشتێك لەلای ڕێکخراوی زایۆنی بهێنێت، لەسەر ئەو بنچینەیە(شکری غنام)سەرۆکی وەفدی سوری لە1919لەبەرامبەر کۆمیتەی ئاشتی ڕێککەوت لەگەل نوێنەری ئاژانسی زایۆن بۆ ئەوەی یەهودیەکان بتوانن بیَ ڕێگری بۆفلستین کۆچ بکەن تادەبنە زۆرایەتی حوکمیشی دەگرنە بەر،لەدۆسیەکانی وەزارەتی دەرەوەی فرنسا بەلگەنامەیەك دۆزرایەوە بە ژ:3547 ی رۆژی 15/ 6/ 1936تیایدا کۆمەلێك سەرکردەی عربی ئەو وولاتە داوا لە فرنسادەکەن هەر لەسوریا بمێنێتەوە ، لەو ناوانەی تیای بوە ( سليمان الأسد ومحمد سليمان الأحمد ومحمود أغا جديد وعزيز أغا هواش وسليمان المرشد ومحمد بك جنيد ..) ،  بەهەمان ئارِستە مەلیك فەیسەل لە 1919/5/3 ڕێکەوتنێکی لەگەل (حایم وایزمان) مۆر کرد پێکهاتبو لە 9مادە[58]،لەهەوان ڕاشکاوانە تر دروست کردنی ئوردەن بوو بەرامبەر پشتیوانی لە ئیسرائیلی داهاتوو ،دروست تر بلین ئەو ولاَتانە لە بنەچە بۆ دژی یەکێتی عەرەب وبۆ پاریزگاری ئیسرائیل دروست بووینە، لەدوا هیرش ئیسرائیلیش بۆ سەر غزە لە (2009) ولاَتانی ئوردن و میسرو سعودیە و دەسەلاَتی فلستین لایەنگیری ئیسرائیلیان کرد، تائەو ساتەش ئابلوقە خراوەتە سەر فلستین لەلایەن عەرەب خۆی.. سەربردەی زۆرهەیە لەکوردستان لە دوای دروست بوونی ئیسرائیل خەلکی وەك جیهاد بۆ شەڕی فلستین چووینە لەلایەن رژیمە عربیەکان گیراون ،لەکتبی(حول خط الاستراتیجی) ئەوباسانە دووپات دەکاتەو دەلیَ ئەو رژیمانە زیاتر ئەرکیان رزگارکردنی فلستین نەبوە بەلکو شۆرشگیرانی فلستینی چەك بکەن[59]،هەر لەو کتێبە(ص106)دەلیَ لەسالی 1936 رژیمە عربیەکان شۆرشی فلستینیان ئابلوقەداو کوژاندیانەوە لە جیاتی بریتانیا ،هەر

---

[57] هەمان س ص122

[56]- دەقی ریکەوتنەکە بە ئینکلیزی وبە عربی لای نوسەر پاریزراوە .

[59] ناجی علوش-حول الخط الاستراتیجی العام لحرکتنا ولشورتنا ص86

ئەورژیمانەش بریاری دابەشی فلستین وجیگیرکردنی دەولەتی ئیسرائیلیان خۆش کرد،دەشلیٚ ڕژیمی ئوردەنی لەهەموان خراتر بوو ،هەر دروست بوونی ئوردەن بەمەرجی پاسەوانی لە ئیسرائیل بوە ،بۆیە بریتانیا بەشیٚکی لە فلستین بە ئوردەن داو وەریگرت (زیفەی غربی) ص107 وص112، لەلایەکی تریش کاریکی زۆر کرا بۆ دابەشی وولاتانی عربی و کەم نرخ کردنیان، لەکاتی دروست کردنیان لۆرانس ئەوەی ئاشکرا کردو ووتی بەشیٚوەیەك وولاتانی عربی دروست دەکەم کە نرخی سەنتەکیان **نەبیٚت** [60]،واش دەرچوو چەندین سەرۆکی عەرەبی لەدوای لۆرانس ئەوەیان دووبارە کردۆتەوە وولاتانی عربیان بە سفر نرخاندوە ، یەکەم جارسعد زغلول سفری بەکارهیٚنا دوای بە بۆنەی دروست بوونی (جامعەی عربی) بە شیٚوەیەکی فراوان گۆترا جامیعەی عربی بریتیە لە کۆی 22 سفر[61]،لە هەرەدوایش معمر قەزافی لەکۆنگرەی عربی لەبەغدا بەکاری هینایەوە ، بەو هۆیەوە لەکاتی دروست بوونی جامعەی عربی شیخ امجد زهاوی چوە سەردانیان وزۆری هەولدا ببیتە جامعەی ئیسلامی بەلام بەگوێیان نەکرد،دوای تیگەیشت ئەوە بۆ تەواوکردنی سایکس پیکۆ وبەلینی بەلفۆرو دامەزراندنی دەولەتی ئیسرائیلە زیاتر[62] ،لەوەش زیاتر (جورج کیرك )خاوەنی کتیبی ( موجز تاریخ الشرق الاوسط A short History Of the Middia East– ) دەلیٚ پرۆژەی ناشیۆنالیزمی عەرەبی (واتە عروبی) لە ( دار المندوب السامي البريطاني) دروست کراوە ، بەشیکی تر زیادی ددەکەن ودەلیٚن جامعەی عربی بەرجەستەی راستەقینەی ئەو بۆچوونەیە .

دوای سەرنەکەوتنی شۆڕشە ئاینیەکانی خەتابی(لە مەغریب) وموختار(لەلیبیا)و مەهدی(سودان) وعبدالقادر(لە جزائر) و شۆرشی بیست لە عیراق ...رۆژئاوا بەهاریکاری تەیاری عروبی بە ئارەزووی خۆی کەوتە پارچەپارچەکردنی عرب ، بە یەکجاری ، چەندین دەستەو تاقمی سیاسی عەرەب دروست

---

[60] کوتلوف –ثورة عشرين ص211

[61] من قضايا الثورة والانسان العربي...ص29.

[62] الامام امجد الزهاوی –كاظم المشايخی ص220

بوو هەندیکیان بە ئاشکرا لەلایەن زلهیزانی دنیاو هەندیکیشیان غەیرەعرب دروستی کردبوون ، یەکەمیان الجمعیة السوریة لە 1857 دروست بوو، دوای جمعیة العربیة لە 1875، دوای ئەوانش دروست بون: 1ـ جمعیة العربیة، 1875م لە دمشق وتەرابلس. 2ـ جمعیه بیروت ـ سالی 1880م. 3ـ جمعیةالسوریة الفتاة ـ 1889، سەرۆکەکەی جمیل معلوف 4ـ جمعیة الوطن العربي دامەزرێنەری خیرالله خیرالله، 1895م لەباریس. 5ـ جمعیة رابطة (الوطن العربي)، نجیب عازوری دایمەزراند لە 1904م لە باریس.. 6ـ جمعیة القحطانیة، خلیل حمادە دایمەزراند لە 1909م 7 ـ جمعیة العربیة فتاة لەپاریس، 1911م. 8ـ حزب اللامرکزیة، 1912مم. 9ـ جمعیة بیروت الإصلاحیة، 1912م، لقەکانی چوە: دمشق، بیروت، حلب، بغداد، البصرە، الموصل.. 10ـ حزب العهد، 1912م لە نێو ئەفسەرانی عراقییەکان. ..[63].

دوا جار وبەو پەیرەو مەبەستە سەرۆکانی عرب قایل بوون بە پێی ریکەوتنامەی سایکس پیکۆی 1916 و ، دوایش بەڵینی بەلفۆریان لە 1917 جارِدا و فەلەستین و سنجاقی قودسیش درایە یەهودی ، بە فەرمی دیزاینە سیاسیەکە ەبەرجەستە بوو لە پەیماننامەی سیڤەر لە 1920بەو شێوەی خوارەوە: سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی 94 هەتا 97. ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (95). حیجاز بەپێی ماددەکانی (98-99). بەو شێوەیە میسر لەمادەی (101). سودان لە مادەی (113). مەغریب و تونس لە ماددەی (118). لیبیا بە ماددەی (121).

بەو شێوەیە کۆمەڵێك وولات بە دیزاینێکی سیاسی نامۆ دروست کران بۆ ئەوەی 1- جێی وولاتێکی دەستکردو نامۆی وەك (ئیسرائیل)یش ببێتەوە,2-تامیلەتی عرب گەشە نەکاو پەرتەوازەبن 3- حوکمی دیکتاتۆریان بەسەرا سەپاندن...دوای 80 ساڵی حوکومیان رِێك ئەو مەبەستانەی دارِژابوو لە سایکس بیکۆو دیزاینی رۆژهەلاتی ناوەراست هێنایانەدی, وایان کرد وولاتانی عەرەبی دواکەوتووترین میللەت بن, دیکتاتۆر بن, پەرتەوازە بن, هەردەم پێویستیان بە یارمەتی نیو دەولەتی بێت, .... لەو کاتیەوە قۆناغ دوای قۆناغ جارِی پرۆژەی چاکسازی دەدرێت

---

[63]ـ لەو سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە: أـ الموسوعة المیسرة.. ص444-445، ب- دراسات في الوطن العربي.... ص60-64. ج ـ الصحوة.. ص311 دـ الاسلام والعلمانیة... ص81

،پاساویشیان ئەوەیە کە وولاتانی عربی بەو هەمو داهاتە سروشتیەی کەچی لە ڕوەکانی تەکنیکی وزانستی وسیاسی ویاسایی وتەعلیمی ..زۆر لەدواوەیە، لەکتیبی ( حتمية التغير –في الشرق الأوسط)ڕاستڤوخۆتر ئڤو وڤسفة دڤكات : منذ إستقلال العرب الشيء الوحيد الذى قدمه هو 1-الحروب 2-التوتر بين العالم العربى والعالم المتحضر 3-مشاكل الداخلية 4-عدم وجود الحرية 5-حكم قبلى 6-الطريق الوحيد للتغير هى إما الإنقلابات أو الإغتيالات 7- سياسة فيها يساوى عنف ..[64] ،جگە لەنەوت تەنها 1٪ی بازاڕی جیهانی کەل وپەلی وولاتانی عربی تیایە[65] ، لە ڕاپۆرتێکی (بەڕێوەبەری نەخشەی سیاسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی لە ژێر ناوی :**نحو ديمقراطية شاملة فى العالم الاسلامى 2003–**کە پرۆژەی رۆژهەلاتی ناوەراستی گەورەی ئەمریکی پشتی پێ بەستوە)[66] دەلێ ئیسرائیل تاکە وولاتێکە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەتوانین پێی بلێین دیموکراسی، میلەتی عرب 50 بەقەد یەهودە کەچی خەلاتی نۆبلی زانیاری 10بەقەد عرب وەرگرتوە ، ئیستا زۆربەی ئەو وولاتانە لەچوارچیوەی (وولاتانی پووچ-دول الفاشله)هەژماردەکرێن وەك ناعوم چۆمسکی لەتویژینەوەیەکی(الدول الفاشله)وایان وەسف دەکا ، ئەوەی جێی سرنج بوو وولاَتانی رۆژئاوا بۆ خۆیان دیموکراسی بوون, بانگەشەی هەناردەی دیموکراسیان بۆ جیهان دەکرد, کەچی بۆ وولاَتانی عەرەبی پالَپشتی دیکتاتۆریان دەکرد..... تا میللەتان لێیان پڕ بوون جاڕی شۆرشیان داو بەهاری عەرەبی لێ هاتەدی .

---

[64] د احمد طحان-حتمية التغير فى الشرق الأوسط،دارالمعرفة ط12006م،بيروت ص22-23

[65] ئەو راپۆرتە هەندێ لای لە پرۆژەکانی چاکسازی بلاو کرایتەوە ..بۆ زیاتر بڕوانە : د احمد ابراهيم-مشاريع الإصلاح فى شرق الاَوسگ ص420-

[66] پرۆژەی رۆژهەلاَتی ناوەڕاستی گەورەی ئەمریکی پشتی بە (3) توێژینەوەی بنچینەیی بەستوە :1- مركز الدراسات الاستراتيجية والدولية حول التحديث والديمقراطية فى العالم الإسلامي 2- توێژینەوەیەکی (ریتشارد هاس Richard Hass ) بەڕێوەبەری نەخشەی سیاسی وەزارەتی دەرەوە 3-دوو ڕاپۆرتی سالانی ٢٠٠٣-٢٠٠٢ لە( برنامج الأمم المتحدة للتنمية) و ( تقرير التنمية الانسانية العربية) .

کەواتە بوهاری عربی زادەی ئیش وژانیکی قوولە هەمەلایەنە، ڕەگی دەچیتەوە سەر سایکس پیکۆی 1961، وئەوجارەش لە هەموی سەرکەوتو نەبێ ت وەك بوهاری ئەوروپی دریژەی دەبێت وبە بوهاری گەلانیکی تر کۆتایی دیت .

سیفاتی هاوبەشی دیکتاتۆرە عربیەکان: دیاری کردنی ئەو سیفەتانە دیاری کردنی سنورو ئیمکانیەتی شۆرش و راپەرینی بوهاری عربی دیاری دەکات ، دیکتاتۆریە عربیەکان ناسنامەو جۆری دەسەلاتیان جیا بوو ، هەندیکیان مەلەکی وهەندیکیان کۆماری ،عەلمانی ونیمچە ئاینی ، سۆشیالیستی ولیبرالی ،..بەلام هەر هەمویان لەو خالانەی خوارەوە پیکدەچوون :

1-تاکرەوی وخۆ بەزلزانین وراویژ نەبوون وزۆر مەرکەزیەت.، کەسی یەکەم هیلی سوورە بۆباسی راگەیاندن ورەخنەو هەلسەنگاندن. سزا و پاداشی نامەعقول.

2- ئیعتمادکردنە سەر هیزو سوپاو ئاسایش و دەست بەسەراگرتن متمانە نەبوون بە میللەت.کەچی هەمو ووتارەکانیشیان بەناوی خواوشەعب بوە .

3- مل پیێ کەچ کردنی خەڵکی و زیندانی و تەزکیە و (تەرغیب و تەرهیب) کۆکردنەوەی خەڵکی لە حزب و تاقمەکەی بەزەبری دەسەڵات دیاردەی هەرە زەقی ئەو سیستەمەن .

4- هەڵدەستیێ بە دروست کردنی ئەنجومەنی کارتۆنی بەناوی پەرلەمان و گەل و جارجار هەڵبژاردنێك سازدەدەن ،دەنگی لە 99، 99٪ دەهێنیێ[67]، تەنانەت سەرۆکی عێراقی لە ساڵی (2002) لە 100٪ دەنگی هێنا.

5- ، نازناوی باڵایان پیێ داوە لەوانە (خاوەن شکۆ، قائد الفذ، سەرۆکی هێژا، سەرۆکی سەرۆکان، سەرۆکی بیێ هاوتا، فخامة، سیادة، ..

6-حزبیکی سیاسی دەسەلات ومووچە دروست دەکا، بوونی خەڵکی تری پیێ هەرس ناکریێ جگە لە حزبەکەی خۆی، لەناو حزبەکەشی تاقمە بچووکەکەی،لەویش خۆی خۆی وخانەوادەی . معارەزەی

7-دروست بوونی بڕیارِ حەدی و بڕیاڕی سەرۆك لەسەرووی دەستوورو وولات وئاین ونەریتە ..

8-هەردەم مەدح کردنی سەرۆك وپادشاو بیئەوەی کەس بتوانی باسی هەلەکانی بکا هەتا لەکاتی

---

[67] بۆ باسی ئەو جۆرە سیستەم وحزبانە بڕوانە : فرانتزفانون – معذبو الارض ص102

شكستيش .

(داود ئۆغلۆ) سيفەتيكی تری بۆ زياد كردوون ودەلىٚ  پتەو كردنی ناو ناوەرۆكی ئەو دەولەتە عربيانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست پيويستی بە ليكجياكدنەوەی ئاين لە سياسەت ودەولەت وفەرهەنگ وكردوە واشيان كرد بۆيە دەبتە سەرچاوەو قەيرانی دواكەوتەيی وناسنامە[68]

ڕێك دەسەلاتدارانی عربی پيچەوانەی ئەو حيكمەتەی ئيبن خەلدوون كە لە بەشی (في أن العمران البشري لابد له من سياسة ينتظم بها أمره) باس لە پەيوەنديەكی ئۆرگانيكی نێوان بەرپاكردنی شارستانی وسياسەتی دادگەرانەو عيبادەت دەكا ، ،تيايدا دەلىٚ رەچاوی بەرژەوەندی گشتی وراويژ بە زاناو شارەزايان ودووركەوتنەوە لە گەندەلی وخزمايەتىو بالبالينی و خۆويستی بكە ..بۆيە (وەك لەسەروو دەركەوت) بووينە دواكەوتووترين وولات ومياەتی جيهانی .

<u>سنوری شۆرش -(منطلق ومدی)ی بەهاری عەرەبی</u>**:** لە بيركاری دۆمەين ورێنگ هەيە, بەهەمان شێوەش لە شۆرشدا مەدای هەيەمەبەست لێی راپەڕينەكە جارێ تۆنسە بەلام ئەگەروشيانی هەيەچەند وولاتی تر بگريتەوە ،تۆنس بە (منطلق)هەژماردەكريت و ئەو وولاتانەی ترييش كە دەشيت بەهۆيەوە ڕابپەڕن (مدی)ی پيدەووترێ ، مەداكان بە هۆی كۆمەلێك سيفاتی هاوبەش دياری دەكريت (وەك لە برگەی سەروو دياری كرا) ، لەو وولاتانە دەبيتە شەپۆل و مەدرەسەو سيستەميك دەگريتەوە كە معارەزەييان ڕێنەداوە،كە پيكەوەيان دەگريتەوە بوهار بەرپا دەكا، شۆرشی فەرەنسا 1779كاريگەريكانی كەوتە سەر چەند ميللەتێك، وەك لەسەروو باس كراو كەچی كاريگەری نەكەوتە سەر وولاتانی ئەسكەندينافيەو روسيا لەبەر ئەوەی ناسنامەی وجەوهەری دەسەلاتيان لەگەل ئەوروتا ڕادەيەك جيا بوو ، شۆرشی ئۆكتۆبەر1917ی روسيا بە سەرۆكايەتی لينين بەهەمان شێوە هەندێ شوێنی گرتەوە هەندێ شوێنی نەگرتەوە, بۆيە لە كۆتايدا كۆمەلێك دەولّەتی لی دروست بوو بەناوی (سەربازگەی سوشياليستی), هەرچەند ماركس و ئەنجلس و لينين پێشبينی هاتنەدی شۆرشی پرۆليتاری ماركسی لە وولاّتانی سەرمايداری بالاّ بكرێت, بەلاّم لە روسيا سەری هەلّداو هاوشێوەكانی روسياش گرتەوە, لە نموونە نوێيەكانی بوهاری ئەورووپی لە كۆتايی سەدەی بيست و لە 1989تا

[68] داود ئوغلو- العمق الستراتيجى ص364

1991 هەموو ئەوروپای نەدەگرتەوە, دەتوانین بلێین ئەوروپای رۆژهەلاتی دەگرتەوە, ئەو وولاتانەی کە لە ژێر کاریگەری شورشی ئۆکتۆبەر بریتی بوون لە وولاتانی شیوعی (پۆلەندا, رۆمانیا, بولگاریا,....), دوای تەواوی وولاتانی سوشیالیستی جیهانی گرتەوە, هەرچی شۆرشی ئیسلامی ئێرانە لە 1979 ئەویش ئاستێك لە میللەتانی دەگرتەوە بریتیی بوولە بەرپاکردنی ڕابوونی ئیسلامی دروست بوونی بزوتنەوەی ئیسلامیەکان,... ئێستا لە ژێر رۆشنایی ئەو کورتە شیَ کردنەوەی کاریگەری شۆرشەکان بەڕوونی دەزانین (مەدای) پڕیشکی ئەو شۆرشە چەند وولات دەگرێتەوە, بە کورتی ئەو وولاتانەی عەرەبی دەگرێتەوە وەك دیکتاتۆرین, لە سەرەتا دا وا ڕابینرا(3) قۆناغ بێت:

1-وولاتانی علمانی تووند وەك تونس- جەزائیر- میسر- لیبیا- سوریا بگرێتەوە.

2-ئووردن و مغریب و بحرین و یەمن و کویت.

3-سعودیەو قەتەر و عەمان.... بگرێتەوە.

وا چاوەڕوان کرا ئەو بەهارە کاریگەری لەسەر ئیسرائیل و لبنان وعیراق نەبێت(واتە نەبێتە بەشێك لەو بەهارە) چونکە ئەو 3 وولاتە ناسنامەو سروشتی حوکمیان جیایە ،ئەو پێش بینیانە وەك خۆی نەهاتەدی,ئەگەر بەو ستاندەرەش نەیەتە دی جاروایە پێی دەووترێ لەباربردنی شۆڕش، یەکەمیان واچاوەڕوان دەکرا جەزائیر پێش ئەوانی تر بێتەدی, سوریا زۆر تاخیر بێت, کەچی وانەهاتە دی, ئینجا ئەو بەهارەی عەرەبی لە سوریا چەقیوە, دەتوانین بلێین ئاسۆی دیار نیە بەو تەکانە بگاتە قۆناغی سێیەم و سعودیەو ئیمارات و.... بگرێتەوە, لە هەموو شورش و بەهارێك هەریەکە لە بەرامبەری مەترسی دروست دەکەن, ئەو ڕخنەیەش لە بەهاری عەرەبی دەگیرێ دەلێین بە هەولَو تەقەلاَی ئیسرائیل و وولاتانی عەرەبی کەنداو قۆناغی سێیەم بەهاری قەتیس هێشتەوە لە لێدانی ئەو وولاتانەی بەسەنگەری بەرگری دژ بە ئیسرائیل هەژمار دەکرین, لەپێشوتر عێراق, لەو بەهارەش لیبیاو سوریاو حیزب الله....وەرچەرخا بۆ دژ بە ئێرانیش بە تایبەتی لە سوریا, لەگەلَ ئەو

ڕەخنەیەش ئەو وولآتانە دیکتاتۆر بوونە ئەگەر دژی ئیسرائیلیش بووبن, یان پێشووتر لە چوارچێوەی وولآتانی (جبهە الصمود والتصدی)[69] بووبن .

سەرجەم هەموو ئەو بەهارانە هەرماون گوزارش لە قۆناغی جیاجیای بزوتنەوەی مێژوو دەکەن, کە بەهەردوو شێوەی گۆڕانی لە سەر خۆ گۆڕانی توند بەڕێوەدەچن.بەلام سەرنەکەوتن و نەهاتنەدی ئەو پیشبینیانەی مەدای شۆرشو بوهاری عەرەبی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دیزاینە ئالۆزەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و سایکس پیکۆ لەلایەك لەلایەکی تر بۆ سروشتی عەقلی عربی (کە هەندی موفەکیری عەرەبی بە قەیرانی عەقلی عربی گوزارش دەکەن)کە ئەویش کاریگەرە بەکەلتوورو فقهیکی ئەمەوی تایبەت . بۆیەش سروشتیکی خویناوی وەرگرتوە ، لە ڕاستیدا لە هەمو جیهان سروشتی ڕاپەڕین وشۆڕش لە ناوەندە دیکتاتۆرەکان توند دەبێت، هەروەك لە تیۆرەکەی (جیۆڤۆنی سارتۆری)هاتوەو دەلێ گواستنەوە لە رژێمی دیکتاتۆری تاك حزبی بۆ دیموکراسی وفرەیی مەحالە بە خۆشی بێت ،بەلکو بە تەقینەوەی جەماوەری وحوین رشتن دەبێت ، لەرۆژهەلاتی ناوەراست بەو هۆیانەی سەروو زیاتر توندتر وخویناوی تر دەبێت، هەر گۆڕانکاریەکی سادەش پیویستی بە تواناو هەژانی گەورە هەیەو هەبوە ، بینیمان گۆڕانی شای ئیران چ هەژانیکی گەورە بوو ،بەلام تورکیا لەسەر دەستی (دادوگەشە پیدان ) لەسەرخۆ تر بوو چونکە تا ڕادەیەکی چاك دیموکراسی بوو بەلام لەهەمان وولات گۆڕان بە ئاڕستەی چاکسازی نیشتمانی ودانان بەکورد پیویستی بە هەژان هەبوو ، بەو شێوەیە وولاتانی عربی بە ئەندازەی تۆخی دیکتاتۆریەت وکەلتووری عروبی توندترو هەژانی گەورە تر دەبیت .

## چارەنوسی بوهاری عربی

لەگەل سەرهەلدانی ڕاپەڕین ترس ولەرزیکی زۆر کەوتە نیو دام ودەزگای حکومەتە دیکتاتۆریەکان ،هەندیکیان بیریان لە چاکسازی کردەوەو هەندیکیشیان بیریان لە پیلان وبەرگرتنی ئەو ڕاپەڕینە

[69] ئەو بەرەیە لە پەراویزی کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی سالی 1978ی بەغدا پیکهات لە وولاتانی(عراق-لیبیا –ریکخراوی رزگاری فلستین –سوریا) .

کردەوە ، بە تایبەتی وولاتانی کەنداو ، تەنانەت کار گەیشتە فتوادان هەرەوەك کۆمەلیکی زۆر لە مامۆستایانی ئاینی ئەو ناوچەیە ئامادە بوەو دەبێ بۆ پینەکردنی عەیبی گەورەی ئەو وولاتانە هەمو جۆرە فتوایەك بدات ، پیشوو تر فتوای یارمەتیدانی بریتانیا دژ بە عوسمانی ،فتوای دانانی بنکەی سەربازی بریتانی ودوایش ئەمریکی لەو ناوچانەو تەنانەت لە نزیك کەعبەش، فتوای هینانی هیزی رۆژئاوای بۆ شەڕە ناوەخۆییەکانیان بەتایبەتی شەری دوەمی کەنداو لە 1990، تادەگاتە فتوای حرام کردنی ڕاپەرین وبوهاری عربی ،هەندیك لەو فتواسەیرانە هەلدەبژیرین :

ابن عثيمن وصالح فوزان : فالمظاهرات كلها شر سواء أذن فيها الحاكم أو لم يأذن.

ثیشوو تریش ابن باز : المظاهرات الرجالية والنسائية من أسباب الفتن وظلم الناس والتعدي على بعض الناس ولكن الأسباب الشرعية النصيحه والدعوة إلى الخير التي شرعها أهل العلم وأصحاب النبي بالمكاتبة والمشافعة مع الأمير والسلطان ومكاتبته ومناصحته دون التشهير به.
لە زۆر لای تر بە تایبەتی ئەوانەی پێیان دەووترا مامۆستایانی ئاینی سەلەفی جۆری (خەتی دەسەلات) .

بەو شێوەیە بوهاری عربی ئیستا چەقیوە لە شام نەگەیشتە قۆناغەکانی تر ، لەو وولاتانەی سەریش کەوتون شۆرش و راپەرینەکان تووشی تاقیکردنەوەی وا قورس هاتون نابیتە سەرمەشقی هاندانی ئەو وولاتانەی کە شۆرش وڕاپەرینیان پینەگەیشتوە ،هەندی هۆی تر هەیە وادەکا ڕاپەڕین وشۆرش لە وولاتانی عربی وەك پیویست سەرکەوتوو نەبیت لەوانەش دیزاین و سەرخانەکانی سایکس پیکۆ (لەسەر هەردووئاستی دەڤەری وجیهانی) ،بوونی ئاسایشی ئیسرائیل لەناوچەکە ، لەلایەکی تریش هەندێ سیفات وفەرهەنگ وسەقافەی تایبەتی بە تاکی عرب کە جاروایە بە قەیرانی عەقلیەتی عربی ناوزەد دەکرێ.
دیزاینی رۆژهەلاتی ناوەڕاست زیاتر ئەزمەی خستۆتە نێو عەقلی عربیش ،بە تایبەتی فەبوول کردنی عەرەب بە سیستەمی ئینتداب (دریژەی لە ئەزمەی عەقلی عەرەبی لەو مەوسوعەیە بخوینەوە)-لە

چارەسەری بۆ ئەوەی هەمو ئەوکیشانە وتەنانەت عەقلی عربیش ڕاست نابێتەوە ئەگەر ئەوەی لەسەر سیستەمی ئینتداب بینا کراوە تێکی نەدەن .

بەشیکی تر پێیان وایە هەر ئەسلەن کاری مەدەنی ودیموکراسی بۆ ئەو ناوچەیە ناشیت ولەباردەچێت ،لەوانە _هنتیکتۆن خاوەنی( نهایە التاریخ ) پێی وایە دیموکراسی ومەدەنی بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست و وولاتانی عربی نابیت .

(3)

## شارستانی الحضارة Civilization

**ئەوانەش دەگریتەوە(فەرهەنگ ،لۆگۆس،میتۆس، سوڕی شارستانیەکان– دورة الحضارات، دەستگۆڕی شارستانی(تداول الحضارات)، احتكاك الحضاری ،ئەرسنال، ئەنترۆثیا..**

لەمانای شارستانی هەردوو سەرچاوەی ئیسلامی ولاتینی لە جەوهەردا لێك نزیك دەبنەوە ئەگەر چی لە ڕوالەت بە جیاوازی دەردەکەوێ ، تەنها جیاوازیان هەر لایەی نمونەی بەردەستی خۆی کردۆتە توخمی پیناسەکەی ،هەریەکە لە ابن مەنزورو ئیبن خەلدوون وسیف الدین ئامەدی زۆربەیان (حضارة — شارستانی )بەرامبەر (ڕەوەندی-بدوی) لیکداوەتەوە[70] ، هەرچی لاتینیە بەدەوی ودواکەوتنی عەرەبی لە دەوروبەر نەبوە ،بەلکو ئەو بەراوردەی نیوان شاری وگوندی زەق بوە ،بۆیە(شارستان– Civilization) بەمانای (شار)و (civer) دانیشتوانی شارەکە (شاری)[71] ، بە پێی (المعجم الشامل) civilization یەکەم جار لەسالی 1704 لە ڕۆژئاوا بەکارهاتوە بەمانای( التمدن)[72]هەر مانای بە شاری بوون دەگرێتەوە ، یان وەك (د علی اکبر ولایەتی)بە قوولتر ماناکانی هێناوەتەوە (Civilization) بەمانای (الاقامة والاستقرار)[73] ،بەو واتایەی گوندی جینشین نەبووینەو وەك شاریەکان کە شارستانیەیان پێ ووتوون ،زۆر نزیکە لە (**كتاب الاضداد**)ی ئیبن ئەنباری کەووتویەتی (ناشارستانی) ئەوانەن کە لە بادیە دادەنیشن، لەیۆنانی کۆن ئەوانە ناویان نراوە ساراسێنس(Saracens)، جیایە لەگەل (دیمۆس)ی یۆنانی کەدەشتەکین وزاراوەی دیموکراسی لێبەرجەستە بوو،سارینس لەووشەی یۆنانی(**Σαρακηνός**) وەرگیراوە، بۆ خێوەت بەکاردەهێنرا،دواتر ووشەکە بۆ عەرەبەکان بەکاردەهێنرا،کە بە واتای دانیشتوی خێوەت و بۆ ئەو کەسانەی بیابانین و کۆچەرین کەسانێك کە توندرەو دلڕەقن، بەجۆرێك ئاگایان لە ژیانی شارستانی نیە،ئەم چەمکە بۆ عەرەبەکان بەکار دەهێنرادوای گشتێنرا بۆهەمو موسولمان

---

[70] ابن منظور– لسان العرب ج1ص102 هةروةها ابنخلدون –مقدمة ص130

[71]نصر محمد عارف - الحضارة-الثقافة-المدنية- المعهد العالمي للفكر الاسلامي ص32

[72] حسن الحفنی –المعجم الشامل ص301

[73] د علی اکبر ولایتی – موسوعه الاسلام والایران ج1 ص37

بەکاردەهات،سەرچاوە ئەکادیمیە کلاسیکیەکان دیسان لەگەل ئیبن خەلدوون نزیك دەبنەوە کەدەلێن بەدەوی و ناشارستانی ڕەسەن ترو میژووی قوول تری هەیە ، ئیبن خەلدوون دەچیتەوە سەر سروشتی بەشەری و رەگەزی عربی و عەجەمی کە پێی وایە عەرەب زیاتر بەرەو بەدەوین وعەجەمیش بەرەو شارستانی،هۆکاری زۆرە بەلام یەکیَ لە هۆکارەکان ولەهەمان کات سەرەنجامیشە ئەوەیە خیل و عەشیرەت لەسەر بنچینەی خوێنە، خێل وعەشایەری عەجەم (بیجگە لەتورك وتۆران) زیاتر لەسەر بنچینەی زێدو نیشتمانە،بەشاری بوونیان ئاسانتر بێت، دوەمیان نزیك تر یەکەمیان دورتر لە شارستانی بوون،لەوەوە دروشمی (اذا البدوی تحضر تفسد)هاتە دی، لە ڕاستیدا هۆکاری بەرپا کردنی شارستانی ئەوەندە ناگەڕێتەوە بۆ نەژادو توخم وڕەچەلەك چونکە لە مێژوودا لەزۆربەی ناوچەکان شارستانی لێبەرپا بوە ،بەلکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چەندە دەستیان بە هۆکار(ئەسباب)گرتوە ،ئەو کۆمەلگەیەی پشتی بە نوشتەو دوعای شیخ وکاهین بەستوە دواکەوتوە ئەوەشی پشتی بەزانست وئەسباب وعەقلانیەت بەستوە شارستانی بەرپا کردوە ،شارستانی نوێی جیهان لە توێژینەوەی ئەسباب دەست پێدەکات .

هەرچی ئەکادیمیەکانە لەوەوە تیکدەکەنەوە لەگەل تیۆرە گەشەسەندنەکانی (مۆرگان وسپینسەرو داروین و..) کە پیناسەکەیان وای لێدیت شاریەکان گەشەسەندووترن لە خەلکی تر کە بەربەریان پیووتون ، لەوەوە تێکەلییەکی لەلایەن یۆنانیەوە کراوە لەگەلٚ (مدینە)و(مدنی)کە لەخوارەوە باسیان دەکەین ، لە ئەسلٚدا زاراوەی شارستانی بۆ لیکجیاکردنەوەی رۆمانە ماقوولەکان لەگەل خەلٚکی تر کە بە (بەربەر)ناوبراوە، تەنانەت لەو کاتی تەواوی کیشوەری ئاسیا (کەلە ململانی بوون لەگەل ئەوروپا) بەبەربەر وەسف کراون لە لایەن هیرۆدۆتسەوە [74]، لە زمانەوانی کوردیش شارستانی بەکارهاتوە بۆ ئەوانەی دانیشتوی شارن وپیشکەوتنەکی زیاتریان هەیە ،یان ئەو شاریانەی کە ئامرازی نویَ بەکاردەهێنن لەبەرامبەر دەشتەکی کە پابەندن بە ژیان وئامرازە کلاسیکیەکان ،بەو شێوەیە لەکوردیش شارستانی و مەدەنی زۆر لێك نزیك دەبنەوە بۆیە لەو دواییە زاراوەی (ژیار) بۆ شارستانی دارِژراوە،بەلام واپێدەچی زاراوەی شارستانی قوول بێت بەشیکی زۆری ئاریەکانیش بەکاری دەهێنن ،

---

[74] تاریخ العالم ص58.

له كۆنەوە (شارا) خواوەندی خوارووی میزۆپۆتامیا بوە خوای شاری ئۆما بوە[75] ..رەنگە شاری کوردی وعەجەمی لەوە هاتبیت .

<u>بنەچەو پێناسی شارستانی</u> : واباوە کە یەکەم نووسەر ئەو زاراوەی شارستانی بەکار هێنابێت (میرابۆ1757)بووە لە دوو کتێبی **(مقال في السكان)و** **(مقال في الحضارة)** ، دەشلێن یەکەم وەرگێرانی (سیفلایزەیشن )بۆ (الحضارة) دەگەریتەوە بۆ ترجمەی کتیبی (اتحاف الملوك الالباب بسلوك التمدن فی اوروبا)لەسەردەمی **محمدعلی** پاشا ، بەو مانایە دیسان ڕەسەنایەتی ئەو زاراوە دراوە پال ئەوروپا ،لەکاتێکا هاوتای زاراوەی (شارستانی)لە زۆربەی نوسینەکانی زانایانی ئاینی ئیسلام بەکارهاتوە بەناوی (اعمار) ، ئینجا زاراوەی اعمار ڕەگەزپەرستی تیدانیە ،هەرچی بنەچەی (Civilization ) لەجیاوازی نێوان **شارو لادێ دێت،** (میرابۆ) لەوە سەرکەوتو بوو کە پیناسەکەی زیاتر لە ئاینی ورۆژهەلاتی نزیك بوو نەك لە بنەچە لاتینیەکەی ودەلێت شارستانی هەر میللەتێك بریتیە لە پێشکەوتنی تەعمیرو زانیارو زانستی ، بەو ڕەگەزپەرستیەی پێناس نەکرد زیاتر بە مانای (تەعمیر) کە نزیکە لە مەبەستەکانی ئاینی پاش کەمێکی تر باسی دەکەین. بەلاّم بە روونی دەردەکەوێت پیناسە بەشەریە پەتیەکان هەروەك زۆربەی دیدەکانی تریان هەر لە سەرەتادا رەهەندیکی رەگەز پەرستی بە هەموو ئاڕاستەیەك پێوە دیارە، کە مانای نەریت و ئاستی ژیان و پەیوەندی ئەخلاقی شار بالاّترە لە لادێ، رۆمان بالاّترە لە خەلّکی تری (بەربەر)بۆیە ئەو پێناس و دیدە هەتا فراوان تر بێت خوارتر دەبێت,... لە کۆنەوە تا ئیستا رۆژئاوا خۆی پێ لەسەرووی هەموو خەلّکی جیهانە .

بە هەمان شێوە ئەو دەردە لەتەرجەمەی عەرەبی هاتۆتە رۆژهەلاتیش ، بۆیە زۆربەی چەمك وزاراوەکان وەك پێویست ماناکە هەلناگرێ ،چونکە پیناس وماناکەیان لە رۆژئاوا وەرگێڕاوە نەك بە پیناسی خۆمالی ، ئەگەر پیناسی خۆمالی بوایە چەمکی(عمران)ی ئیبن خلدوون گونجاوتردەبوو لە (الحضارة) ،هەندێکی تر بە(مدنی)(نەك مدنی- **مجتمع** مدنی)،بەلکو بە شاری لێك داوەتەوە ، تا

---

[75] بۆ زیاتر لەبارەی خوای (شارا) بڕوانە : قاموس الخرافات ص149

ڕادەیەك تێكەلیەك لە نێوان چەمكی شارستانی ومەدەنی وفەرهەنگی(ثقافی) بەدی دەكریت ، لە ئەنجامی تەرجەمەی بێڕاست كردنەوە ، تەنانەت سلامە موسی یەكەم كەس چەمكی (الثقافة )ی بەرامبەر (culture) داناوە و دەلێ بە هەوەنتە دامنەناوە بەلكو پشتم بە بۆچوونی ئیبن خەلدوون بەستوە ، كەواتە واباش بوو تەرجەمە نەكا بەلكو لە راڤەی ئیبن خەلدوون زاراوەیەك هەلبژێرێ ، بەگشتی لەدواجاردا ڕوانگەی ڕۆژئاوایی لەو پیناسانە زۆر زالە بۆیە زیاتر پیناسەكانی شارستانی جۆریك لە ڕەگەزپەرستی وەردەگرێت نزیك لە پێناسی (پیترمان)كەلە كتێبی (مدخل الی إجتماع الحضري) بەمانای شارستانی بە شارو ئەهلی شار لێك دایتەوە بە چینێكی پێشكەوتوو و ژیرو پێشڕەو زانیوە، ئەهلی لادێش بە دواكەوتەیی و (بداوە- ڕەوەند)و بێ عەقلی لە قەلەم داوە ..،زیاتر مەوسوعە كۆنەكان بەو ئاڕستە ڕۆیشتون لەوانە (موسوعە لالاند)لەبەرامبەر ووشەی شارستانی مەدەنی داناوەووتەواو یەكسانی كردوون [76]، لەوانەی نویش (معجم المصطلحات السیاسیة ) بەلای ئەوەیە كە سەرچاوەی شارستانی وشار یەكە[77]، ودەبێت ڕاست بكرێتەوە ،ئەومەوسوعەیەی بەردەست یەكێ لە ئەركەكانی ئەوكارەشە .

بە كورتی هەندێكیان پێناسە سەلبیەكانی زیندوو كردۆتەوە كە بالآیی نەریت و ڕەوشت و جۆری ژیانی: ڕۆمان بەسەر خەلكی تری(بەربەر)، شار بەسەر لادێ (بەداوە)، مەسیحی بەسەر غەیرە مەسیحی (ئەتنیك)..دەردەخا.سودێكیش لە تیۆری (ئەرنولد توینبی 1889- 1975) وەرگیراوە لە بارەی (التحدي والإستجابة)، كە تیایدا هاتووە هەركاتێ (تحدی) واتە دوژمن و ترسی دەرەكی نەمێنێ پرۆسەی شارستانی پێشكەوتن و یەكێتی ناوەوە لەباردەچێ،بۆیە ئەو پیناسانە پالنەریكی سیاسی بۆ ئەو سەردەمە دروست دەكا ، لەسەر ئەو بنچینانە زۆربەی سەرۆكەكانی ئەمریكا لە گوتاری سیاسیان دا ترسێكی دەرەكیان داتاشیوە، یان ترسی شیوعیەت، ترسی ئیسلامی، ترسی تیرۆر، ....هتد،لە دوایدا هندكتۆن سودی لەو تیۆرە وەرگرتووە و لە تیۆرەكانی (نایبول) كە دەلێ شارستانی ڕۆژئاوا لە هەموان گونجاو ترە، ئینجا لەوانەی پێشووش بۆ داڕشتنی تیۆرێكی نوێ

---

[76] اموسوعە لالاند الفلسفیە ص172

[77] معجم المصطلحات السیاسیة ص96

لەبارەی نەگونجانی شارستانیەکان لەگەل یەکتر(کە لەبەرگی یەکەمی مەوسوعە باسمان کردوە )...، لەسەر ئەو بنچینەی سەروو وەسف وپێناسیزۆرەوپەرتەوازەیە،بە ئەندازەی (تێوری پەرەسەندن) مشت ومڕی لەسەرە ، هەر لە (بۆلینویس, هرقلیتس, سقرات, ئەفلاتون.... تا ابن خلدون, شپینگلر, هیگڵ,مارکس،دورکایم،تایلۆر،توینبی...هنتگتۆن)باسی ئەوبابەتەیان کردوە هەرچوار مەدرەسەش (لیبرالی-سۆشیالیستی—شیوعی-ئاینی)ڕوانگەیان لەوبارەیەوە لیکجیایە، بەو بۆچوونەوە پیناسە کانیان دەپەریتەوە سەدەی ئیستامان زۆر پیناسی جیا جیا بۆ شارستانی کراوە دەگاتە سەدان ،هەندێکیشیان هەرلەگەل (مەدەنی وفەرهەنگ و کەلتووری)یان تێکەڵکردووە ، وەك لەخوارەوە زیاترلەپیشاندانی پیناسەکانیان بۆ شارستانی دەردەکەویٚ:

+ ابن خلدون: شارستانی پیچەوانەی ڕەوەندیە(بداوە) ،بەدەوی دژی بینایە(تەعمیر) زۆر بەتوندیش بەستوویەتیەوە بە جوانی سیستەمی سیاسی، پیشی وایە عەرەب کەمتر ڕوویان لە شارستانیە . هەم (لسان العرب) و (قاموس المحيط) وەك ئیبن خەلدوون بە پێچەوانەی (بداوە)باسیان کردووە.

+ لسان العرب: زیاتر گوزارشی لە تیڕوانینی ئاینی کردوە بە پیچەوانەی ئەو پیناسە رەگەزپەرستیانە مانای شارو دێو پیکەوەژیانی هەمو دێت[78] .

+گلایدگلاکهۆن:شارستانی بریتیە لە کۆی ئەو چرایانەی تاریکی مێژوویان ڕووناك کردۆتەوە .

+ فەیلەسوفە ئەلمانیەکان (هیگل —نیتچە- سپینۆزا ..) باش تر شارستانی وفەرهەنگیان لیك جیا کردۆتەوە ،یەکەمیان بە گەشەی مادی ودوەمیش گیانی ومەعنەوی .

+تایلۆر: شارستانی بریتیە لە(زيادة في الضروريات) واتە بەشی کمالیات شارستانیە...

**+**هەندێکش ڕێك بە پێشکەوتنی تکنیکی کۆمەڵ دەلێن شارستانی

+ تۆمسۆن- لویس :هەردوکیان لە کتیبی(مشكلات السكان) پێیان وایە شارستانیەتی لەکۆتایدا بەپێی هەموو زانا کان بریتیە لە ژیانێکی خۆش تر.

---

[78] بروانە : لسان العرب المادە: بدا

+ (ر-براون)له كتێبی (العلوم الطبیعی للمجتمع) شارستانی وژیرخانی كۆمەلایەتی لیكجیاكردۆتەوه ودەلیّ: (الحضارة تجد في انماط سلوكیة افرادهوفي تفكیرهم وشعورهم) بینما بناء الاجتماعي (هو شبكة العلاقات الاجتماعیة التي تربط افراد خلال نقطة زمنیه معینه). بەلاّم نۆرتس دەلّیّ: (بناء الاجتماعي لیس جانبا من جوانب الحضارة وانما هو الحضارة الشعب بأكملها[79])

+جۆن ئیف : شارستانی مانای ئەو مەلّبەندەی پیشەسازی لیّ بلاّودەكرێتەوه .

+ویل دیورانت و ئەلڤەردوییەر : بە زانست وتكنۆلۆجیایان لیكدایتەوه .

+میرابۆ:شارستانی هەر میللەتێك بریتیه له پێشكەوتنی تەعمیرو زانیارو زانستی پێشرەو بێت كه رەچاوی سوودی زانیاری گشتی و یاسایی بكات.

+ كتیبی(تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب) : بەهای سیاسیه یەو دام ودەزگای كۆمەلایەتی وئابوریشه كه ژیانیكی هاوبەش دروست دەكا[80].

+پیناسی وەزیری دەرەوەی ئیران :دەرچوون له كاروباری بەدەوی بۆ سیستەم ورژێم[81].

+فەرهەنگی لۆنگمان له پێناسی شارستانی(مادە:civilization) به ئینگلیزیەكەی:

civilization: an adrancced stage of human social development .

+ معجم المصطلحات السیاسیة : شارستانی پیچەوانەی ڕەوەندی وبەدەویه [82].

+تعاریف المصطلحات السیاسیة: الحضارة مشتقة من التحضر والتمدن( الحضر والمدینة) وهي مجموعة المنجزات الفكریة والاجتماعیة والأخلاقیة والصناعیة التي يحققها مجتمع معين في مسيرته لتحقيق الرقي والتقدم.

---

[79] موسوع العلم الاجتماع ص132

[80] جورج قرم-تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص96

[81] د علی اكبر ولایتی –موسوعة الاسلام والایران ج136

[82] د وضاح زیتون -معجم المصطلحات السیاسیة ص13

+ الموسوعة الميسرة : الحضارة هى عملية التحضر والتقدم ..دەڵێ شارستانى لە سادەييەوە بەرەو ئالۆزى (ئەوەش ريك راى سپينسەرە بۆ گەشە)[83]،بەهەمان شێوەش(معجم المصطلحات السياسية)لە پيناسى بۆ شارستانى سپينسەرانەى بۆچوەو دەڵێ :شارستانى ماناى ئەو جۆرە پيشكەوتنەيە كەلە سادەوە بەرەو ئالۆزى [84].

+كوردۆن چايلد: بريتيە لە كۆمەلە خەلكيكى زۆرى شارى لە بازرگان وتوكنيكارو فەرمانبەروپياوانى ئاينى و..دەبيتە پيشڕەو وچەقى ژيان بۆ هەمولايەك[85] .

+موسوعەى لالاند :كۆمەليك ديارەدى كۆمەلايەتى شايەنى گواستنەوەيە توخمى هاوبەشى ئاين وئەخلاق وهونەر وتەكنيكى كردۆتە بنچينە [86].

پيناسى عەلمانى بەگشتى بەلاى مەيلى مادى هەيە ، هەرچى لايەنى ئاينيە پێشكەوتنى ماددى لە ژێر رۆشنايى ئەخلاقى ديارى كردوە ، وەك (رفاع الطهطاوي) ئەو كاتى نووسەرە عەرەبى و نيشتمانى وئيسلاميەكان وەك ناپلێون واى ووتووە (مەدەنى شارستانى: ماناى ژيانى خۆشى و رابواردن نيە بەڵكو پەروەردەو زاڵ بوونە نەفس و رەوشتێكى بالاَيە )[87]بەلاَم علمانيەكان جۆرە پێناسێكى ترى رۆژئاواييان پىَ دەداو باسيان لە (وولاَتە شارستانيەكان)(پێشكەوتووەكان)(متمدنە) هەتا (قاسم امين)دەڵى ئەگەر ئێمە هەموو شێوازى ژيانمان لە ووردو درشتى هەتا لە خواردن و جلوبەرگ و سەلام كردنيش وەك رۆژئاوا نەكەين ئەوا لە قوڕاوى پاشكەوتن رزگارمان نابێت .... ئەوەش مەدەنيەت و شارستانيە[88].

---

[83] الموسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية ص178

[84] معجم المصطلحات السياسية ص145

[85] دارين تۆمسن –مشكلات السكان ص172

[86] موسوعة لالاندالفرنسية ص172 .

[87]الحضارة – الثقافة – المدنية ص42

[88]قاسم امين- (المرأة الجديدة)

**ئەو پیناسانەی فەرهەنگ وشارستانی تێکەل کردوە :**

پیناسیکی زۆریش هەیە نەیتوانیە بەڕوونی شارستانی ومەدەنیەت وفەرهەنگ وکەلتوور لێك بکاتەوە، لە کاتێکا (Civilization) بەمانای جێنشین وئارامی وگەشە ، هەرچی (culture) بە مانای پەروەردە ،یەکەمیان بەلای تەکنیك وبەرژەوەندی ولە کۆمەلگەی پیشەسازی نزیکە ، لە دوەما بەرەو بەهاو ئاکار ،ئەو ئاکارانەی زیاتر لە کۆمەلگەی کشت وکالی نزیکە هەر بۆیەش (کەلچەر وکەلتوورو ئەگریکەلچەر)لیك نزیکن ،لە (معجم الشامل)بە ئاشکرا تر دەلێت لە رۆژئاوا ناتوانرێت هەریەکە لە شارستانی وcivilization ومەدەنیەت وفەرهەنگ لێك جیاکەیتەوە ،چونکە بەدوای یەك دێن ،ئەو دەلیت سیڤیل لە سەرەتای سەدەی 18 هاتە کایەوە بەو مانایەی کە هەرکەسێك ژیانی وجل وبەرگ ونەریتی وەك شاری لیبیێت ولە نەریتی گوندی وکشت وکالی داڕنرێت ،لەدوای ئەو پرۆسە ئینجا شارستانی دەست پێدەکات[89] لەوانەی کە باش نەیانتوانیە ئەو دوو چەمکە لیکجیاکاتەوە ئاستی بالایان هەبوە ،نمونەی تایلۆرلە کتیبی (الثقافة البدائية- 1871)کەویستویەتی فەرهەنگ پیناس بکا سەری هاتۆتەوە سەر شارستانی ومەدەنی وکلتور.. هەر بە تەرجەمەی عربیەکەی دەلێت : الثقافة هى ذلك الكُل المعقد الذي يشتمل على المعرفة، والعقيدة، والفن، والأخلاق، والقانون، والتقاليد، وما إلى ذلك من القدرات والعادات التي يكتسبها الإنسان من حيث هو عضو في المجتمع، بە هەمان شێوە (قاموسي حزب البعث) وای بەسەرهاتوە لە ڕاڤەی مانای (الثقافة الرقية –کەلتور-فەرهەنگی میلەتان –بە واتای لایەنی مادی گەشەی ئاوەدانی )[90] کە ئەوەی دوایی لای ئەو قاموسە ڕاستە بۆ شارستانی .

+ لە معجم القرن21 ص179 وەسفی مەدەنی بە دژ بەبەربەری دەکا ئەوەش هەمان وەسفی شارستانیە .

+موسوعەی لالاند جیاوازیەکی وای نەکردوە لەنیوان (حضارة) و(مدنی) پیناسیشی واکردوون کە زیاتر فەرهەنگ دەگریتەوە (کۆمەلێك دیاردەی کۆمەلایەتی) شایەنی گواستنەوەبێت ،ئینجا توخمی

---

[89] حسن الحفنى – المعجم الشامل ص301

[90] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص33

ئاين وئەخلاق وهونەر وتەكنيكی كردۆتە بنچينە هاوبەش كە هەمان بنچينەی ەرهەنگە ، شارستانی ومەدەنی بەرامبەر بربری ودڕندەیی بەكارهيناوە وەك ئيبن خەلدوون [91].

+ تعاريف ومصطلحات سياسية هامة: مشتقة من التحضر والتمدن( الحضر والمدينة) وهي مجموعة المنجزات الفكرية والاجتماعية والأخلاقية والصناعية التي يحققها مجتمع معين في مسيرته لتحقيق الرقي والتقدم[92].

+هندگتۆن لە كتيبە بە ناوبانگەكەی(ململانێی شارستانی) بە ڕوونی چەمكەكانی شارستانی وفەرهەنگ وكەلتوری تيكەل كردوە ،دەلێ شارستانی بريتيە لە فەرهەنگە فراوانەكانی ميلەتان [93].

+پاپا شنۆدەی سێيەم : وكلمة الحضارة واسعة جداً في معناها, فهي تشمل الثقافة والرقى وسائر القيم والعادات السائدة[94].

+دائرة معارف قرن عشرين: ئەويش بە (پيچەوانەی رەوەندی وبەدەوی هەژماركردوە) دوای دريژەكەی خستۆتە بەشی (مەدەنی)[95]

+ هەتا كتێبی ووردی وەك (مقدمة في انثرؤبولوجيا ..)لە وەرگێرانی (اتصال حضاري)**بە** فەرهەنگی گوزارش كردوە[96] ،..

---

[91] موسوعة لالاندالفرنسية ص172 هةروةها ص241

[92] تعاريف ومصطلحات سياسية هامة -الأكاديمية العربية في الدنمارك -المادة:حضارة

[93] صدام الحضارات ص68-

[94] مقالات متفرقة لقداسة البابا شنودة الثالث - نشرت في جريدة أخبار اليوم يوم السبت الموافق 28-04-2007

[95] دائرة معارف قرن عشرين ج3ص454

[96] مقدمة في انثرؤبولوجيا الأجتماعيةص475

+ لەهەموان زیاتر کوردۆن چایلدشارستانی وشاری بە جارێك تێکەل کردوە ،میژووی شارستانی ومیژووی شاری یەکخستوە ،هەرلەپیناسەکەشی دەلیّ لە کۆمەلە خەلکیکی زۆری شاری لە بازرگان وتەکنیکارو فەرمانبەروپیاوانی ئاینی و..[97] .

جیاوازیەکی بنچینەیی لە نێوان فەرهەنگ(الثقافة) وشارستانی(الحضارة) هەیە ، بۆ لیکجیاکردنەوەبۆ پرسیکی وا ئالۆز دەبیّ پشت بە کتابیکی وەك قورئان ببەین ،لەبارەی شارستانی واهاتوە (هو انشاکم من الارض واستعمرکم فیها)[98] لەبارەی فەرهەنگیش : علم الانسان ما لم یعلم[99]، بەکورتی شارستانی بریتیە لە کۆی کارە دەستکردەکانی تێکرِای مرۆڤ لە سروشتا ،لێرەدا ئەگەر مانای (ئەنترۆپیا )ئەو ووزانەی بێت کەسودیان لێوەرنەگیراوە ،ئەوا ئەنترۆپیای سروشت رِێك مانای دۆمەینی شارستانیە ، هەرچی فەرهەنگە بریتیە لە کۆی وەدەست هێنانی زانیاری تێکرِای مرۆڤە ،لە یەکەما تەعمیری زەوی لەدوەمە پرۆسەی( علم مالم تعلم)ەیە، وەك دەردەکەویّ بەو ئەندازەی لێکجیان ئەوەندەش پانتایی هاوبەشیان هەیە ،بۆیە لەلای زۆر لا تێکەل کراوە ، کیشەکە لە بنەچەدا لەوە دێت کاتی فەرهەنگی تاك و فەرهەنگی کۆمەلایەتی جیاوازیەکی وەرگرتوە بەتایبەتی لە رِوانگەی رۆژئاوا ،ئەو کاتە فەرهەنگی کۆ نزیك لە پیناسی شارستانی دەبیتەوە ، لە رۆژهەلات وجیهانی ئیسلامی فەرهەنگی تاکی زیاتر نەزەریەو شارستانیش پراکتیکیە ،یەکەمیان پیشرِەو سەرمەشقەو دوەمیشیان بەرهەم وزادەی ئەوە ، کارل مارکس راڤەی (قیمە- بایی)ی کردوە زۆر نزیکە لە شارستانی بێئەوەی مەبەستی وابێت ، ماندوو بوونیکی زۆری بە پێناسی (قیمە) کردوەو بەستوویەتی بە کاری مرۆڤ ،سەرکەوتو نەبوە لەو تەقەلایەی ،بەلام بۆ لایەکی تر دەتوانین بەکاری بهێنین ، ئەگەر ئەو هاوکیشەیە هەموار بکەینەوە (قیمە)لە چوارچێوەی بەرهەم وئابووری فراوان تر بکەین بۆ

---

[97] دارین تۆمسن –مشکلات السکان ص171-172

[98] القران الکریم – سورةهود اية61

[99] القران الکریم سورة علق اية 5

شارستانی ، هاوکیشەکە وەك خۆی بهیلینەوە لەبارەی (قیمە وکاری مرۆڤ)[100]، دەبینین بریتیە لە بەرپا کردنی شارستانی ،تێکڕای کاری مرۆڤ بەرهەمی مێژوو ڕێك قەبارەی شارستانیە .

لەوەوە پرسێکی تر ڕوون دەبێتەوە کە زاناو بیریاریکی زۆر بەلای ئەوە چووینە کە (شارستانی)پیچەوانەی (ڕەوەندی-بداوە)بێت ،پیناسێکی تەواو دروست نیە ،مادام شارستانی بریتی بێت لە کۆی کاریگەری تەعمیری زەوی بێت لەلایەن تێکڕای مرۆڤەوە ،ئەوە بەدەویش ڕەهەندی شارستانی تێدایە ئەگەر کەمێکیش بێت ،بۆیە پیناسێکی تەواو نیە ، هەردوولا شارستانی هەژمار دەکرێت بەلام ئەوەی بەدەوی هەرە خواروی شارستانیە ،چونکە شارستانی تەواو پیکەوە ژیانیکی یەکتر تەواوکردنە بەهۆی جیای پیشەو بەرهەم وپسپۆری ،هەرچی ڕەوەندی وبەدەویە دابڕان وژیانیکی سادەی بێتەواوکەریە بەلکو تەواوی پانتایی ژیانی لە (زەروورات)کۆ دەبێتەوە (رادەیەکی کەمی(کمالیات)ی تیدایە .

## ناسنامەی شارستانی(رۆژئاوایی وروژهەلاتی و ئاینی )

**دەگۆترێ لەکۆنەوە یەکەم جار لە روسیا بە وولاتانی ئەوروپا ووترا رۆژئاوا ،بەهۆی ئەوەی کەوتبوونە رۆژئاوای روسیا ، دوای ئەو ناوە بوە جیهانی وئیتر مانای شارستانی رۆژئاوایی ماناکەی ڕوون دەبێت .**

ناگەڕێینەوە بۆ مشت ومڕی یەکەم مرۆڤ لە نێوان بۆچوونی ئاینی وبۆچوونی (تیۆری پەرەسەندن) مادام ئەوانەشکستیان هینا لە قازانجی ئاینی ویەکەم مرۆڤ (ح ئادەم)بوە ،هەرلەگەل ئەویش یەکەم بناغەی شارستانی بەرپا دەبێت ، بە پێی (بداية والنهاية ـ ابن كثير) ح ئادەم ڕۆژی هەینی دروست

---

[100] لەبارەی پەیوەندی قیمەو کار بڕوانە : کارل مارکس- راسمال(نقدالاقتصادالسیاسی) ص49

کراوه[101]، هەرچی توێژینەوەی مسیحیە ئەوا یەکەم مرۆڤ پێی نابێتە سەرزەوی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژی دوای مانگی دیسمبر(12/31) ونزیك سەعات پینجی پاش نیوەڕۆ، نێوان ئادەم ونوحیش 1056 سالە [102]، هەندێك مێژووی دابەزینی بۆ 35 ـ 40 سەدە پ.ز. دەگێرنەوە، )، یوشر(دەلی ژیان لە 4004 پ.ز. دەستی پێکردووە، هەرچی (لایتفوت)ە دەڵێ: ژیان لە 13/ئوکتوبەری/4004پ.ز. سەعات 9ی بەیانی دەستی پێکرد[103]،لە ئیستادا زۆربەی کۆکن کە ( ح ئادەم )یەکەم جار لە شاری غوکلاندی هند[104] شارستانی بلاو بوویەوە ، لەتەورات نەوەکانی دوای(ح ئادەم) تا (ح نوح)دیاری کردوە[105]، بریتین لە: شیس، ئەرواس، کیناس، ماهلەیل، یارید، ئیدریس، ماتولسلخ، لامیك، نوح .

کەواتە ئەگەر شارستانی یەکەم پیش (ح نوح) بە ویران هەژمار بکەین، یەکەم گلپەی شارستانی دەگەڕیتەوە بۆ میزۆپۆتامیا، هەرچەندە کەمە جیاوازیەك هەیە لە نیوان قورئان و تەورات لەبارەی شوینی گیرسانەوەی پاپۆڕەکەی ح نوح ، تەورات لە (سفرالتکوین- ئەسحاحی 8) دەڵێ لەڕۆژی

---

[101]ـ لە احمد بن حنبل دەگێڕیتەوە: گوایە ڕۆژی شەمە خۆڵوخاك دروست کراوە، یەك شەمە شاخ وکێو، دووشەمە دارو درەخت، سێ شەمە خراپە کاری، چارشەمە ئاگروڕووناکی، پێنج شەمە گیان لەبەر، ڕۆژی هەینی لە نێوان عەسرتا عیشا ح ئادەم دروست کراوە.

[102] مكتبة الكتب المسيحية - كتب قبطية - المكتبة القبطية الأرثوذكسية ، كتاب النقد الكتابي: مدارس النقد والتشكيك والرد عليها - أ. حلمي القمص يعقوب .

[103]ـ بروانە: داروین-اصل الانواع ص35

[104] بڕوانە (معجم ديانات وأساطير العلمية...، ج3 ص150) دەلێ: لە بناری شاخی هیمالایەی دابەزی سەرزەوی.بەلام هنری فورستر دەلی لە غوکلاند، لە ( تاريخ جرجان -بن يوسف الجرجاني) هاتوە: سمعت أبا الحسن محرز بن جعفر يقول وجدت ببلد الهند حجرا منقوشا بالعبرانية ببلد سرنديب يقال اهبط آدم

أنا الموجود فاطلبني تجدني

فان تطلب سواي فلا تجدني

تجدني أين تطلبني عتيدا

قريبا منك فاطلبني تجدني

[105]ـ سەیری العهد القديم - تكوين (5) بکە، لە قورئانیش باس لە تەمەن درێژی ئەو نەوانەی ئەو سەردەم دەکا.

601/7/17ی تەمەنی نوح لەئەرارات گیرسایەوە[106] ، هەروەهاکتێبی (حضارة وادی الرافدین) و(موسوعة العربیة المیسرة) وزۆری تر ئەو ڕایەیان هەیە ، لە قورئان ئەو بەرواره نیه دەلیّ: 900سال بانگی خەلکی کردوە ئینجا تۆفانەکە هەلسا ،هەروەهاش قورئان دەلیّ لە (جودی) گیرسایەوە[107] نەك ئەرارات، هەندێکی تر زیاتر ووردەکاری دەکەن بە پێی نزارگەکانی مسیحی وموسولمان و یەزیدی ئەوا لە لوتکەی نیڤاتی جودی گیرسایتەوە ،کەواتە جارێکی تر شارستانی لێی دەستی پیّکردۆتەوە،کوردستان لانەی شارستانی ئێستایە، هەر یەکەم شارو شارستانیش بە پێی هەمو سەرچاوە ئەکادیمیەکان لەو ناوچەیە سەری هەلداوە .

دوای بزوتنەوەی کۆچ بەدوای ژیان دەستی پیکردوە بۆ کیشوەرەکانی تر، ئەو بەرهەمە شارستانیەی لەکۆچ وجوولە وەدەست هاتوە لە جیگیری ومانەوە لە شوێنی خۆی کەم تر بەدەست هاتوە ، کەمایەتی وموهاجیر هەولیداوە کاری عەقلی بکا بۆ پڕکردنەوەی ئەو نەقسەی کە ناتوانی بە هیز وپانتایی فراوان بیکا (بەتایبەتی ئەوانەی فکریشیان هەیە)..بۆیە شارستانی وپیشڕەوایەتی وداهینان لەسەردەستی ئەوانە زیاتربوە ..لەو بارەیەوە یەهودیەکان خاوەنی پەیامیکی تایبەتین کەچی کەمدەستیش بووینە بۆیە زیاتر پیشاوەریك ببنە میلەتیك .کاری عقلیان کردوە زیاتر لە کاری بازوویی،کاری شاریان کردوە زیاتر لە گوندی،کاری پیشەسازیان زیاتر کردوە لە کشت وکالی ، ..کاری کشت وکالی بەستنەوەی مرۆڤە بە ناوەندیکی جوگرافی دیاری کراو کەمتر بواری داهینان وگەشەلی شارستانی پێویە ، هەر بۆیەش خواوەندی زراعە زۆرە ،خواوەندی پیشەسازی زۆر کەمە لەویش کەمتر خواوەندی بازرگانیە ، بۆیە شارستانی بەزەحمەت لە قۆناغی دەرەبەگی گەشەی کرد خەریکە بلێین ئەو تیۆرەی (مۆرگان وسپنسەرو مارکس وئەنجلس) هەلەیە کەدەلیت شارستانی سەرمایەداری لە هەناوی دەرەبەگی هاتە کایەوە ،ڕاستیەکەی ڕۆلی کۆچ وتیکەلی شارستانی وفەهەنگ وکەلتورەکان بوونە هۆی گواستنەوەی شارستانی دەرەبەگی بۆ شارستانی سەرمایەداری ،

---

[106] ( 3 ورجعت المیاه عن الارض رجوعا متوالیا.وبعد مئةوخمسین یوما نقصت المیاه 4 .واستقر الفلك فیالشهر السابع في الیوم السابع عشر من الشهر علی جبال اراراط)– کتاب المقدس (العهد القدیم) سفر التکوین(اصحاح 8).

[107] سورەتی (هود) ئایەتی (44)

لەوەوە تیدەگەین چۆن شارستانی ئەو دەست ئەو دەست دەکا(تداول الحضارات) ، چۆنیش شارستانی لە رۆژهەلاتەوە بەرەو رۆژئاواو ئەوروپا رۆیشتوە ، سەربردەی سەرهەلدانی شارسانی لە رۆژئاواو لاوازبوونی لە رۆژهەلات وجیهانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی 15 و16 ، هەر ئەو دەمەشە میژووی سەرهەلدانی سەرمایەداری ،ئەوەیان ڕای زۆرایەتیە ،بەدەگمەن سەرچاوەیەکی وەك( ئییڤ رۆنوار ) لە کتیبەکەی(رجال الاعمال الایطالیون فی القرون الوسطی) دەلێ سەرمایەداری لەسەدەی 12 ڕادەست پێدەکات و یەکەم جار لە ئیتالیا بناغەکانی دامەزراوە نەك لە بریتانیا وەك باوە [108]،زیاتر لەوە موسوعەی لالاند دەلێ چەمکی مەدەنیەتیش هەر لەسەدەی 16 ەوە وەك زاراوە بەکاردیت، یەکەم جار لە (روح القوانین-مونتیسکو)ی رەهەندی یاسایی پیدرا و بەکارهات بەو مانایە یاساییەی کەهەمو ی لەژێر کاریگەری یاسا بێت[109] ، بەشێکی زۆریش بۆسەدەی 18ی دەگێڕیتەوە لەوبارەیەوە (گریگۆری کلارك)ڕێك بەرواری 1813ی کردۆتە خالی وەرچەرخان[110].

ئەوەی سەروو ڕاستی میژووی شارستانیە کەچی لەو سەردەمە واباوە کە رۆژئاوا لەکۆنەوە پیشڕەون لە هەمو ڕوەکانی شارستانی ،باسی هیرۆدتسوەك(باوکی میژوو)دەکرێت، ئەبیکرات- باوکی پزیشکی، سیۆکریتشس –باوکی هونەر،هیرکلیتس- باوکی دیالکتیك،ئیکلیدو فیساگۆرس باوکی ئەندازەو ژمارە، ستراپۆ- باوکی جوگرافیا، تالیس وبیتلیمۆس –باوکی گەردوونناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش زۆری تریان باوکی چەند لقیکی تر..، وا دێتە بەرچاو کەهەرچی زانیاری وشارستانی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە کۆنەکانی ئەوروپی، کەچی بەسەرنجێکیووردتر دەردەکەوێ زۆربەی زانیاریەکانی یۆنانی کۆن سەرچاوەکانی رۆژهەلاتین،بەنمونە هەندێکی وەردەگرین:

بە پێی هەندی سەرچاوە تەواوی فلسەفە سەرچاوەکەی رۆژهەلاتیە،لە بارەی بنەچەی شارستانیش (ویل دیورانت) لە پیشەکی کتیبەگەورەکەی (قصة الحضارة)بەو دەقانە دەستی پیکردوە :(تراثنا الحدیث" وفيه تاريخ الاختراع والسياسة والعلم والفلسفة والدين والأخلاق والأدب والفن في أوربا منذ

---

[108] جورج قرم-تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص149

[109] موسوعة لالاند ص241 .

[110] گریگۆری کلارك-الاقتصادالعالمی ص13

تولى نابليون الحكم إلى عصرنا الحاضر، إن قصتنا تبدأ بالشرق، لا لأن آسيا كانت مسرحاً لأقدم مدنيّة معروفة لنا فحسب، بل كذلك لأن تلك المدنيات كونت البطانة والأساس للثقافة اليونانية والرومانية)[111]،براتراند راسل دەلیّ فلسفەو زانست لەلای دەریای سپیەوە بەرەو ئەوروپا هاتوە، هەروەك تالیس وئەفلاتون وهیرۆدۆت ووتویانە زانستەكانی بیركاری وفەلەك وئاینی لە رۆژهەلات بۆ رۆژ ئاوا هاتوە [112]،بە پیّی ( كتیبی فكر الشرق القدیم )یەكەم جار ئەرستۆ دانی بەوە نا كە فلسفەی سروشتی لە تالیس وەرگیراوە ئەویش لەسەدەی 6ی پ ز لە رۆژهەلاتی وەریگرتوە[113] ، تەنانەت بیری فلسفی چوار توخمە بنچینەیەكە(ئاوو وهەواوا ئاگروگلّ) كە تەواوی فلسفەی یۆنانی وجیهانی تەنیبۆوە،زیاتر دەدریتە پال ئەنپادیكلیس(495-435 ق م)[114] ئەسلەكەی رۆژهەلاتیە،لە ئاینی زەردەشتی بە ڕوونی هاتوە ، هەتا نیشانەی (+) نازیایەتی كە بە ئەلّمانی پیّی دەوترا (سواستكا ) ئەوە نیشانەی(خاچ) نەبوو،بەلكوو هیمایەكە میللەتانی پیّشووی زەردەشتی ودوای مەغۆل و جەرمانی كۆن هاتوە[115]، گوزارش لەو چوار توخمەكە دەكا،(مەسحەفی رەشی) ئیزیدیانیش باسی ئەو چوار توخمە وا كردوە:(خوا دابەزیە قودس فەرمانی بە جوبرائیلدا كەمیك خۆل وهەواو ئاگرو ئاوی تیكەل كردئادەمی لیّ دروست كرد)[116] .

هەتا زاراوە شارستانیە كۆنەكانیش ئەوەی لیّبەدی دەكریّ ،زاراوەی (ئەسترۆنۆمیا)لاتینی كە تایبەتە بە گەردوون ناسی ئەسلەكەی رۆژهەلاتیە ئەگەر زیاتربیپشكنین كوردیە لە (ئە ستیّرە —نامە) هاتوە، بەلگەی تر زۆرن كەسەرچاوەی شارستانی ئەوروپیش زۆربەی رۆژهەلاتیە ،تەنانەت زاراوەی (ئەرسنال)ی ئەوروپی لە(دارالصناعە)ی شارستانی ئیسلامی هاتوە،یەكەم جارلە ئیتالیا (دارسفن)بوە

---

[111] *ويل ديورانت-قصة الحضارة- ج1ص9*

[112] علم الإجتماع ص141

[113] جون كولر- الفكر الشرقي القديم - ترجمة :كامل يوسف حسين مراجعة :د .إمام عبدالفتاح إمام ص7

[114] الفلسفة والفيزياء- ج1 ص44

[115] مةوسوعةى جودى - مادة :نازى

[116] ئةنستانس مارى كةرمةلى-كتيبى ثيرؤزى ئيزيديةكان ل79 ئايةتى 17 لة مةسحةفىَ رِةش.

دارسنا چوه ئیسپانیا بوه  ئەرسنال بەو ناوە چوە هەمو ئەوروپا[117] ،بە پێی وەسفی (المسعودی 896 - 957 م) دەلێت بەهۆی ئەوەی ئەوروپا لە ڕۆژدوورن ناوچەکەیان ساردبوەو گەرمی کەمتر لەشی مرۆڤەکانیان هەیە ،بۆیە لەشیان سۆرو سپی وقەبەیە ،تیگەیشتنیان زەحمەتە ،پیشکەوتنیان کەمە ،شارستانیان بالاّ نیە[118]، ئەو باسی دواکەوتنی شارستانیان ناکا باسی هۆکارەکەش دەکا ،مانگا پەرستی لە یۆنان وئەلمانیاو تەواوی ئەسکەندیناڤیای لەهندەوە بۆیان چوە،زیاتر لەوەش زۆربەی شارستانی ویاسا کۆنەکانیش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕشی پێغمبەرێك هاتوە، لە سەر ئەو بنچینەیە دەبینین شارستانی رۆم ویۆنان ومیسرو چین ومیزۆپۆتامیا ..بەرهەمی پێغمبەرانن ، بەهەمان شێوە کە دەگۆترێ کۆپەرنیك وگالیلۆ یەکەم جاردۆزیانەوە کە زەوی بەدەوری خۆر دەسورێتەوە، کەچی ئەوە لەشارستانی ئیسلامی بویان چوە ، بەپێی هەندێ سەرچاوە (قەزوینی ) پیش کۆپەرنیکۆس باسی سوڕانی زەوی کردوە[119]، یاقوت حموی دەلی: (وقال قوم الأرض تهوي إلى ما لا نهاية له والسماء ترتفع إلى ما لا نهاية له. وقال قوم إن الذي يرى من دورانا لكواكب إنما هو دور الأرض لا دور الفلك)[120] ،مەقدیسی هەمان ڕاستی دەلێ ،ئەلبیرۆنی لە973 زانیویەتی زەوی خڕەو نیوەتیرەشی دۆزیتەوە.

تەنانەت دیموکراسیش کەوا دەردەکەوێ زادەیشارستانی مرۆڤایەتی ویۆنانی پەتی بێت، کەچی وانیە ، وادەردەکەوێ لە عەجەم وەرگیرابێ ، (هیرۆدۆتس)ەوە لە522پ ز لە کتێبە میژوویەکەی نەقل کراوە واهاتوە : لەدوای ئەوەی فارس ناوچەکانی ئەوانی داگیر کردوە 7 زانای فارسی سێ جۆر حوکم باس دەکەن و لەکۆتایی دا لەسەر پیشنیاری(ئۆتانۆس شێوەی ئیزۆنومیا)هەلدەبژێرن کە هاوشیوەی

---

[117] دائرة معارف اسلامية ص4828 .

[118] مسعودی- التنبيه والاشراف ص23

[119] بروانة: صورة الأرض- احمدعلامة،دارالفتى العربى للنشر ص36

[120] ياقوت حموی –معجم البلدان ج1 ص2.

دیموكراسیه[121]، ئەو كاتی ئەو جۆرە كۆبونەوە گشتیانەی (شێوە دیموكراسی)ناوی جیاجیای هەبوو لە ئەسینا پێیان دەووت(ئەكلیسیاس) ،لە ئەسپارتە پێی دەووترا (ئەپیلا) ،لەعەجەم پێی دەووترا (ئیزونامە) ، واپێدەچێ هەر ئەسلی دیموكراسی ئاینی بێت چونكە ئەمبادیقلس بە باوكی دیموكراسی وەسف دەكرێ ،ئەویش قوتابی (ح داود) بوە ، كەواتە لیبرال دیموكراسی زادەی بیری ڕۆژئاوایە بەلام دیموكراسی مولكی هەمو مرۆڤایەتیە .

زۆر نمونەی تر هەیە كە ناسنامە شارستانیەكەی دەردەخا زیاتر رۆژهەلاتیەو ئاینیشە ، لە سەر ئەو بنچینە قوولّانە( ڕۆسۆ) دەلێت یەكەم دەسەلاّت وشارستانی ئاینی بوە[122]، ئاینیەكانیش زیاتر رۆژهەلاتین چونكە دانیشتوان وشارستانی لە رۆژهەلات بوە، ئەگەر چی لە شارستانیەتی ئیستادا رۆژئاوا پیشڕەوە ڕۆلی گرنگی بینی لە وەرچەرخانی كۆمەلگە بەرەو لۆگۆسی ، بەلام نابیت لەبیرمان بچیت كە پەیام وپەیامبەران ڕۆلی هەرە گرنگی بینیە لە وەرچەرخانی كۆمەلگەی ئەفسانەی(میتۆس) بۆ كۆمەلگەی عەقلانی (لۆگۆس) كە بناغەی شارستانیە،ئەوەش كاری هەرەسەرەكی پیغمبەران بوە تا كۆمەلگە بتوانێ پەیام وەرگرێ و شارستانی بەرپا بكا.

لە سەدەكانی ناوەڕاست ئەوروپا تووشی ئەو دەردە ببوو كە لەكاتی بەیەككگەیشتنی هەردوو شارستانی ئیسلامی وئۆروپی ئەوان تووشی تەقەزوم دەبوون ،ناچار خۆپاریزیان دەكرد لە ئەدەبیات وفەرهەنگ وشارستانی ئیسلام تا ئەو ڕادەیە كتیبەكانی ئیبن روشد وئەوانی تریان دەسوتاند ،لەو بارەیەوە (ئالان دولیبرا) لەكتیبەكی(كیفیة التفكیر فی القرون الوسطی)بە ووردی لەسەر ئەو بابەتی (تثاقف) و تەقەزومی ئۆروپی وەستاوە ،دەلی هەتا شارەزای كتیبەكانی ئەرستۆو ئەفلاتونیش نەبوون لەڕێی جیهانی ئیسلامی بۆیان هاتەوە .

ئیستا پیچەوانە بوویتەوە ئەوە شارستانی جیهانی ئیسلامی بەرامبەر رۆژئاوا لە قەیران وتەقەزومدایە ،ئیستا ئەو زاراوانەی لاوازی شارستانی وەك **ئەیتیما**(atima) (**دونیە** –inferiority ) (ارض لاصاحب لها– res nnullius) ( international caltivation analisis – **تحلیل انماوالدولی**

---

[121] T.Asinclair-Ahistory of Greekpolitical thought p36

[122] جان جاك رؤسؤ- العقد الإجتماعی- ص201 .

)...بەو میلەتانە ووتراوە کە مقەوەماتی مانەوەیان لاوازەبە هۆی باری کۆمەلایەتی وسیاسی و شارستانی وفەرهەنگی ، کار گەیشتە ئەوەی لە پەرەگرافی (4) ودیباجەی ماددەی (22)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە یاسایی کراو وەسفی ئەو جۆرە میلەتانە دەکا (کە زۆربەیان وولاتی عربین) دەڵێت: میللەتی شارستانی ئەوروپی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەولەت[123] .

هۆیەکەی زۆر بەسادەی ئەوەیە : بۆ بەرپا کردنی شارستانی پیویستی بە عەقلی داهاتوو هەیە ، هەروەك چۆن سەردەمێك کەلەرۆژئاوا بە (سەردەمی تاریکی ونەفامی )ناوزەد دەکرا ئەوا عەقل وعەقلانی تومەت بوو،بیرکردنەوە لە داهاتوو حرام بوو ،لە جیهانی ئیسلامیش ماوەیەکی دوورودرێژە ئەو دەردەی تووش بوە ، ئەو ئایەتەی خوارەوەی ئینجیل ریك سست کردنی عەقل وداهینان و بەرپا کردنی شارستانیە ،دەلیت بیرلە دونیاو نەخشەو پلان مەکەنەوە خوا بە خۆی بۆت دەنیری ونوسیویەتی،لە(ح مسیح)ەوەنەقل کراوەدەلیٚ:ئێوە بیر لە سبەینیٚ مەکەنەوە،سبەینیٚ خۆی چارەنوستان بۆ دیاری دەکات(فلا تهتموا للغد.لأن الغديهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره )[124]،هەمان فتوا لەلایەن ئیمامی شافیعی بە شیعر هاتوە:

سهرت أعين ونامت عيون .. . .في أمور تكون أو لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس . . فحملانك الهموم جنون

إن ربا كفاك بالأمس ما كان .... .سيكفيك في غد ما يكون

زۆربەی مەزهەبە ئیسلامیەکان بەلای(جەبرین)و گوایە هەموی نوسرایتەوە لەچارەت ئیتر ماندوو بوونی بۆچیە ،دەڵین ئەو دونیایە مەملەکەتی ئیمە نیە ،هەروەك لە ئینجیلیش هاتوە :( أَجَابَ يَسُوع :مَمْلَكَتِي لَيْسَتْ مِنْ هذَا الْعَالَمِ. لَوْ كَانَتْ مَمْلَكَتِي مِنْ هذَا الْعَالَمِ، لَكَانَ خُدَّامِي يُجَاهِدُونَ.. )[125]، گەورەترین ئامۆژگاری فقهی ئسلامیش تەرکی دونیاکردنە، وەسفی بە جیفە(بۆگەنی) وسەری هەمو

---

[123] بڕوانە دەقی چەکی ئینتدابی فەلەستین کە لە24/یۆلیۆ/1922دەرچوو، 28 مادە بوو.

[124].كتاب المقدس-العهد الجديد مت(34:6).

[125] إنجيل يوحنا 18: 36

گوناح وزۆری تر هاتوه ، ئەودونیایە میوانداریەو سەعاتیکەو ..ئەوانە ڕێك ڕاگرتنی بەرپا کردنی شارستانیە ، لە چەند لایەکی تریش راگرتنی عەقل هەیە (عقلانیەت توومەتە) قوول بوونەوە(تعمق) لە ئاین توومەتە!!! دژایەتی کیمیاوفیزیاو فلسفەو تکنۆلۆجیا ..وا دەکا شارستانی ئیسلامی وەستاو ڕۆژئاوای تەرەقەی کرد.

ئەگینا بەلگەی تر زۆرن کەسەرچاوەی شارستانی ئەورووپیش زۆربەی ڕۆژهەلاتیە ، زاراوەی (ئەرسنال)ی ئەورووپی لە (دارالسفن)ی شارستانی ئیسلامی هاتوه ،یەکەم جارلە ئیتالیا (دارسفن)بوە دارسنا چوە ئیسپانیا بوە ئەرسنال بەو ناوە چوە هەمو ئەوروپا [126] ، ئینجا ئەوروپا هەولیدا جیهانی ئیسلامی لەو دۆخە دواکەوتوە بمێنێتەوە وەك لە مەبەستەکانی سایکس پیکۆش دەردەکەوێ ،جاریش وایە بە ڕاستەوخۆ ڕێگریان لەگەشەی تەکنۆلۆجیاو شارستانی جیهانی ئیسلامی کردوە ، لە سەردەمی محمد علی پاشای میسر (1830-1845) ئەو تەقەلایانە ی بۆ بە تکنۆلۆجیا بوون راوەستینرا لەلایەن ئیستعمار لەدوای داگیر کردنی لە 1881 .

**<u>ئەسل وسەرهەلدانی شارستانی</u>** : لەسەروو میژویەکی خیرای شارستانیمان باس کرد،لیرەش دیسان زۆر جۆرە بۆچوون هەیەلەبارەی کات وشوینی یەکەم شارستانی ئینجا فاکتەری گەشەی وتەمەنی وچۆنیەتی ..، هەیە پیی وایە لە مێژوودا دۆزینەوەی ئاگر بە سەرەتایی (شارستانی)هەژماردەکەن ، کوردن چایلد ئەوڕایەی هەیەو لەلایەکی تریش دەلێ تەمەنی شارستانی لەگەل تەمەنی نوسینە ،نوسین پەیدا بوو شارشستانیش پەیدابوو ، لەبارەی شوینیش پێیوایە (شار)ناوەرۆکی شارستانیە[127], هەر لەهەمان سەرچاوە دەلێ (شار)لە 3000-5000 پێش زاین پەیدا بووە ،بەشیکی تر وەرچەرخانی قۆناغی دەرەبەگی بۆ سەرمایەداری بەسەرەتای شارستانی هەژماردەکەن[128] ، هەندێك شارستانی بە گۆاستەوەی لادێ چوونە شارو گوێڕایەلی نەریت و یاساکانی شار بە **(تحضر)**تێدەگەن بۆ زیاتر لە هەمووان لەوانە پرۆفیسۆر (بیتر مان)لە کتێبی (مدخل الی اجتماع الحضري) ئەو باسە دەکا و مانای

---

126 دائرة معارف اسلامية ص4828 .

127 تۆمسون و لویس - مشكلات السكان ص171

128 جۆردن مرشل-موسوعة علم الاجتماع ج1 المادة:تحضر

شارستانی به شارو ئەهلی شار لێك دایتەوە به چینێکی پێشکەوتوو و ژیرو پێشڕەو زانیوە، ئەهلی لادێش به دواکەوتەیی و (بداوە- ڕەوەند)و بێ عەقڵی له قەڵەم داوە ..ئەوە لەسۆنگەی نەریت و ڕەوشت و جۆری ژیانی: ڕۆمان بەسەر خەڵکی تری(بەربەر)، شار بەسەر لادێ (بەداوە)، مەسیحی بەسەر غەیرە مەسیحی (ئەتنیك)..دەردەخا.، (وی تۆمسۆن له کتیبی : مشكلات السكان) دەلیت شارستانی لەدوای قۆناغی کشتوکاڵ دەست پێدەکا،هەرچی (موسوعه المعرفه) ئەو گوندو شار پیکەوە بەشارستانی هەژماردەکا پێی وایە لەدوای قۆناغی کشت وکالی قۆناغی شارستانی ڕاستەقینە دێت و بەندیش نیه به ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو ، پیشی وایە ئەو کاتی جووتیار لەبەرامبەر ڕاوچی شارستان بوە،گوندنشین بەرامبەر ڕەوەند(بدوی) شارستانی بوە ، هەندێکش ڕێك به پێشکەوتنی تکنیکی کۆمەڵ دەلێن شارستانی ،ئەوەش دەچیتە ڕایەکەی سەروو و گواستنەوە له کشتوکاڵ بۆ پیشەسازی ، ئەوەی ئەو ڕایەی دوای بەهیز دەکا ڕای (ویل دیوڕانت له کتیبی –**قصة الحضارة** )و هاوشیوەکانی که پێیان وایە شارستانی چوار رەگەزیی هەیە (1- موارد اقتصادیه 2- نقم السیاسه 3- التقالید الخلفیه 4- متابعه العلوم والفنون) ، هەندیکی تر هەمان ڕەگەزیان بەجۆریکی تر گوزارش کردوە ( 1- الوضع الاقتصادي. 2-طرق العيش والظروف الطبيعية. 3- العلاقات الاجتماعية بين فئات المجتمع. 4- أنظمة الحكم السائدة. ) ، تایلۆریش پێی وایە شارستانی بریتیە له کارلیك کردن و وەرگرتنی (زانست-ئایدیۆلۆژیا-ڕەوشت – فلسفه-هونەر-..)، لەگەل زۆر ڕای تر .

لەبارەی یەکەم شوینی سەرهەلدانی شارستانی بەزۆری ڕوویان له ناوچەی میزۆپۆتامیایە ، جاریش وایە دەیگێڕنەوە بۆ خوارووی عیراقی ئیستا ، سەرەتای مێژوو لەلایەن زانستەوە لێڵە ، هەر چەندە مادیەکان (هیرۆدتس 484- 425 پ.ز) به (باوکی مێژوو) دەناسن و زانیاریەکانی سەرەتایی تەنها لەوانە وەردەگرن، واشی بۆچووینە که مێژووی کۆمەڵ له ئەلقەی وەرچەرخانی مەیموون بۆ ئادەمیزاد دەست پێدەکا[129]،له دڕندەییەوە بەرەو مرۆڤایەتی بەڕێ کەوتوە ، زۆربەی زانایاوفەیلەسوفانی پیش

---

[129]بڕوانە :انجلز-ديالكتيك الطبيعة—دور العمل فى تحول القرد الى انسان ص194-208، هەروەها تشارلز داروين - اصل الأنواع ،هەروەها سلامة موسى-طريق الطويل نحو الإنسان.

سەدەی21 ڕایان وابوە سەرەتای بەشەریەت ڕاوو دڕندایەتیوبیشارستانی بوە ،بۆیە پۆلینەکانی قۆناغی گەشەی شارستانیان بەوشێوە هەلبژاردوە :( ڕاو ⟵کشتوکاڵ- پیشەسازی) (جادوو- ئاین — زانست) (دڕندایەتی و — بەبەری) (ڕاو, رەوندی,کشتوکاڵ, بازرگانی, پیشەسازی) ( اقصاد ريفي , اقتصاد حضري , اقتصاد العالمي ) (: مشاعی, عبودی, دەرەبەگایەتی, سەرمایەداری, سۆشیالیستی, شیوعی)... ئێستا ئەو بۆچوونە لاواز بووە لەڕووی زانستی. ، ڕاستیەکەی وانیە ،یەکەم شارستانی هەردەبێ لە هند بێت مادام (ح ئادەم)یەکەم جار لەوێ دابەزیە بەتایبەتی دۆلی سند ، هەرچی شارستانی دوەمە لە کوردستانی ئیستایە مادام (ح نوح) لەدوای لافاوەکە لە جودی دابەزیبیت ، وەك لەسەروو باس کرا، (موسوعە المعرفە)یە پێی وایە یەکەم شارستانی لە ئیلام پیش 2700سال پ ز دروست بوە ، پێشوو تر وا دەزانرا یەکەم شارو یەکەم شارستانی لە خوارووی عێراقی ئیستا لەسەردەمی سۆمەریەکان بوە،کەچی بەپێی دوادۆزینەوەی تیمێکی(ئەمریکی وسوری)هاوبەش بە سەرپەرشتی (مگوایرگیپسۆن)ی شوینەوارناسی لە (پەیمانگای ئۆرینتال)ی شیکاغو لە سالی 1999 دەرکەوتدەکەوێتە سەرووی ڕۆژهەلاتی سوریای ئیستا بە ناوی (گردە حموقار-نزیك جودی)،**ئیتر** ئەوە سەرهەڵدانی شارستانیشە ،هەموو ئەو شارستانی وچرا ڕووناکانەی قولآیی مێژوو یەکەم جارلە ڕێگەی هۆکاری دەرەکی و پەیامی ئاسمانیەوە هاتوون .

**<u>دابەشی شارستانی (توانەوە)- کارلێکی شارستانیەکان</u>**

لەو پیناسانەی سەروو وبۆچوونەکانی توینبی تادەگاتە هینتگتۆن وادەردەکەوێ کە شارستانیەکان لێك جیا بن ، هەرمیلەتەو یان هەر کیشوەرەو یان هەر ئاینێك شارستانی خۆی هەبێت ، ئەوە ڕاستە بۆ کەلتوورو فەرهەنگ نەك بۆ شارستانی ، لە ڕاستیدا ململانێی شارستانی هەر نیە ،ململانێی مەدرەسەو کەلتوور فەرهەنگ هەیە ، دەشکرێ بلێین لە قوولایی مێژوو بە هۆی کەم بوونی پەیوەندیەکان شارستانی وکەلتوورو فەرهەنگ والیك نزیك بووبن شوینی جوگرافی پێکی بەستبن و شارستانی میلەتیك لەگەل میلەتیکی تر یان ئاینیکی تر جیا بێت، بەلام بۆ ئەو سەردەمە نابێت،

(توینبی) گەلێ جار شارستانی جیهانی لەسەر بنچینەی کۆمەڵگەی مەسیحی ئەرسەدۆکس، کۆمەڵگەی ئیسلامی، کۆمەڵگەی هندۆسی، ....کۆمەڵگەی وەك شارستانی بەکارهێناوە.هنتگتۆن سودی لەوەوە وەرگرتوەو دابەشی شارستانیەکانی کردوەو پێکیشی داداون، لە ڕاستیدا شارستانیەکان لەناو یەکتر تواینەوە، مردوونەو بووینە نیچیری ئەوی تر ،مەرج نیە تەنها بەهۆی شکستی سەربازی بێت هەروەك ئیبن خەلدوون دەلێت: (بأن المغلوب مولع أبداً بالأقتداء بالغالب)[130]، یەك لەو ئەزمونە دەگمەنانەی سەرکەوتنی مەغۆلە لە جیهانی ئیسلام کەچی دوای خۆیان توانەوە لەو جیهانە .ئەو شازیە لە یاسای ئیبن خەلدوون و ئەوانی تر لە هیزی ئاینی ئیسلام دێت .

جاران شارستانی بەو پلەیەی ئیستا تیك نەچرژابوو،بەلکو جۆرێك لە سەربەخۆییان هەبوو کاتێ پێك دەگەیشتن چەند کارلێکێك لە جۆری (پێکدادان، توانەوە،ناکۆکی ،..،هاریکاری ،زاوزێ ،گەشە،..لێدەهاتە دی، عادەتەن لەدوای توانەوەی شارستانی یەکەم لە دوەما ئەوا توانەوەی فەرهەنگی و(**تقزم الثقافی**) بەدوا دەهات کە لە چەمکێکی سەربە خۆ باسمان کردوە دەکەین .

توانەوەی شارستانی جیایە لەگەل پیکدادانی شارستانی ، هەندی پیکدادانیش هەر توانەوەیە ،یان وورد تر بلێین هەمان توانەوەیە بەلام بە گوزارشی عەولەمی ،پیشوو تر(پیش عەولەمە) شارستانیەکان تاڕادەیەك بەتوندی پیك دەکەوتن دەبوە توانەوەی یەکێکیان،هەروەك لە (معجم المصطلحات السیاسیة)ش لە ڕاڤەی (احتکاك الحضاری)دەلێ پیکدادانیکی کۆمەلایەتی وسیاسی وفەرهەنگی وهونەری لێ دێتە دی[131] ، لە عەولەمە ئەو جۆرە پیکدادان وتوانەوە نامێنێ بەلکو شێوازێکی هێمن وبەردەوام وەردەگرێ ،جاران ئەگەر پیکدادانیش نەبوایە تەمەن بۆ شارستانی هەبوو وەك تۆینبی و ئیبن خەلدون وزۆری تر بە (دورة الحضارات- سوڕی شارستانیەکان)ناوزەدیان کردوە ،کەچی ئیستا شارستانیەکان تەمەن بە یەکتر دەبەخشن وبەردەوامی بە یەکتر دەدەن ،بۆیەش لە ناسنامەی نەتەوەیی وجوگرافی وئاینی وسیاسی داڕنراوە ، لەسەردەمی عەولەمە (کە دەتوانین بلێین لە سەدەی 19 بە چڕ تر دەستی پیکردوە ) شارستانی بوویتە مولکی هەمو بەشەریەت ،ناسنامەی

---

[130] ابن لخلدون —مقدمة تحقیق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر-القاهرة ص192

[131] معجم المصطلحات السیاسیة ص13

نەماوە ،جوگرافیاو نیشتمان وئاین وفەرهەنگ لە شارستانی جیا بووینەوە ، خەریکە فەرهەنگیش ئەو ڕەوتە وەرگرێ، کەواتە لێرەدا دەتوانین پیناسێکی زۆر سادە تر(لەوەی سەرووومان)بۆ شارستانی وفەرهەنگ(الثقافة) بکەین ،یەکەمیان بریتیە لە کۆی داهێنانی مادی بەشەری لە یەکەم مرۆڤەوە تا ئەو ساتە ، هەرچی دووەمیشە(فەرهەنگ) بریتیە لەداهێنانی فکری لەیەکەم مرۆڤەوە تا ئەو ساتە ، بەکارلیك کردنی هەردوو لا(شارستانی وسەقافە) شارستانی فراوانی هەمو بەشەریەتی لیدەردەچی ، کە مولکی گشتیە ،کۆکردنەوەی شارستانی وفەرهەنگیش مەدەنیەتی لێدەردەچێ ، ئەوە زۆر دوورە لەو وەسفەی شاری وگوندی ، یان شارستانی رۆژئاوایی ورۆژهەلاتی ...، لەسەر ئەو بنچینەیە لەلای بەشیك لە ئاینپەروەرانی ئیسلامی زۆر بەهەلەداچووینە کاتێ دژایەتی شارستانی دەکەن بە ناوی (نا بۆ شارستانی رۆژئاوا) ،ئەوە شارستانی رۆژئاوا نیە ، ئەوە لیکنەکردنەوەی کۆمەلێك چەمکە لێی تێکەل بوە ، سەلبیات لە کەلتوورو مەدرەسە وفەرهەنگە زیاتر نەك لەشارستانی .

کەواتە ئەگەر لە رۆژئاوای کۆن و نوێ شارستانی شار سەرچاوەی چاکەو خراپە, حرام وحلال, پێشکەوتن وپاشکەوتن ..... بووە ، ئەوە لە جیهانی ترو جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی ئاین ئەو سەرچاوەیەنیە ، زۆربەی جار گوندو کۆمەلگەی کشت وکالی خاوەنی بەهای مرۆڤایەتی ترن لە کۆمەلگەی شاری و پیشەسازی ، هەروەك (ابن خلدون)یش کە لە (مقدمە) ئەو تیبینیەی کردوە ، (تحضر) جاروایە بەرەو فەسادی دەروا لە رەوشت بەرەبەرە دوردەکەوێتەوە، ئێستاش لە بەراوردی شارو لادێ ئەوە بە دی دەکرێت بەرژەوەندی تایبەت لەشار زیاتر باوی هەیە کە پێچەوانەی مەبادیئە ئەخلاقیەیە بە هەموو سەرئەنجام و لق پۆیەکانیەوە، تەنانەت پاکی ژینگەی گوندو پیسی ژینگەی شار ڕێك گوزارش لە جیاوازی نێوان مرۆڤایەتی لە بەهای کۆمەلگەی کشت وکالی و کۆمەلگەی پیشەسازی ، لە ڕاستیدا نە ئەو بنەمایەی سەرووی رۆژئاوایی ڕاستە نە ئەو بنەمایەی بەدەویش ڕاستە کە دەلێت :( **البدوي اذا تحضر فسد**)[132] ، هەر لێرەش خالیکی گرنگ ڕوون دەبێتەوە ،ئەویش ئەوەیە گوایە قورئانی پیرۆز لە مەبەستی ووشەی (اعرابی) مەبەستی چین وتویژی خەلکی گوندان وبادیە بووبێ ، هەلویستی ئاینی رەسەن ئەو جۆرە روانگە رەگەزپەرستیانەی نیە ،ئەوە هەمان

---

[132] د.وردي – **لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث**،ص 149

تیڕوانینی سەرووی یۆنانی کۆنە کە لە پۆلینی شارستانی جیاوازی لەنیوان شاری وگوندی وڕەوەندی کردوە .

## نەمانی شارستانیەکان

زۆرلەکۆنەوە لەسەر شارستانی و قۆناغەکانی گەشە و بوهاری شارستانی قسەیان کردوە، **زاراوەی (دورة الحضارات— دورة الکونیة)** دەگەڕێتەوە بۆزەمانی یونانی کۆن،بەشێك بۆ بیرۆکەیەکی یەهودی بەناوی (دوره الکونیه) کە پێیان وایە بوونەوەریش بە 7 خول تێدەپەڕی ، هەر خولەی 7000 سالە[133]، هەر لە (بۆلینویس, هرقلیتس, سقرات, ئەفلاتون.... تا ابن خلدون, شپینگلر, هیگڵ, توینبی، ڤیگۆ،هاریسکۆن... ) باسیان لەتەمەن و چارەنوسی شارستانی کردوە ،بەڵام زۆربەیان بەلای ئەوە چووینە کە فاکتەری مەرگیان گەڕاندۆتەوە بۆ کارەساتە سروشتیەکان....،هەندیکیان لە قورئانی پیرۆزیش بەسزازو بە هۆی کارەساتی سروشتی بەروونی هۆو ئامرازەکانی باس کردووە..، ئیبن خەلدوون وتۆینبی وەك پیشینانی خۆیان باوەڕیان بە تیۆری(دورة الحضارات) هەبوە ،پێیان وابوە هەمو شارستانیەکان بە چەند قۆناغیکی(سەرهەلدان-گەشە-بوهاری-پیری-مردن) دەڕۆن[134] ، ( سپینگلر وسۆرکن) بەکەمیك جیاوازی تر: ساوایی- گەنجی- پیری- مردنی, ڤیگۆ بە جۆریکی تری داڕشتوە : سەردەمی وابەستەیی- سەردەمی پالەوانی —سەردەمی داڕووخان.. ناویان لەو پرۆسە ناوە (سوڕی شارستانیەکان- دورة الحضارات))یان زاراوەی سەردەم (دەست گۆڕی شارستانیەکان).... هەندێکی تر بەندیان کردووە بە ئیمبراتۆریەتیکو مردنی شارستانی و ئیمپراتۆریەتەکەیان لیّك گرێ داوە ... ناپلیۆن ڕای وایە شارستانیەکان بە پارووی گەورە خنکاون ، لەکوردەواریش ووتراوە ئادەمیزاد لە ئەستووری دەپسێ، هەرچی (تۆینبی)ە لە کتیبی (دراسه التاریخ) دەلێ شارستانیەکان بە هۆی دووپرۆسەی بنچینەی (تحدي والأستجابة) بەردەوامی دەبێت[135] ،توینبی دەڵی ئەگەر (تحدی)نەما ئەوا (استیجابەش)نامێنێ و شارستانیەکە دەمرێ، نمونەی بە شارستانیەکەی (هایزینبریك)بەهۆی

---

[133] موسوعة الیهودوالیهودیة والصهیونیة ج2 ص19 عبدالوهاب المسیری.

[134] توینبی منهج التاریخ وفلسفة التاریخ-محی الدین اسماعیل ط2 1986 ص70-

[135]أرنولد توینیي- دراسة التأریخ

تەحەدیەکانی عوسمانلی مابوو هەر ئەو نەما ئەویش نەما, بۆیە بەشیك لە زانایان پێیان وایە ئەمریکا لەسەر ئەو تیۆرە دەڕوا و هەردەم دوژمنێك بۆ خۆیان پەیدا دەکەن.. (تحدي الخارجي)-(تحدي اللشيوعي) (تحدي الأسلامي)(تحدى الارهابى)...ئیبن خەلدوونیش خالی لاوازو بەهیزی شارستانی دیاری کردوەو پێی وایە هەندی بنەماهەیە (سیاسەت ودادگەری)بۆ شارستانیەکان دەبنە تەمەن دریژیان وبەرگری لە ڕووخان ومردن ، لە بەشی (فی أن العمران البشری لابد له من سیاسه ینتقم بها أمره) باس لە پەیوەندیەکی ئۆرگانیکی نێوان بەرپاکردنی شارستانی وسیاسەتی دادگەرانەو عیبادەت دەکا ، نامە ڕینماییەکی (طاهر بن الحسين) بۆ کوڕەکەی (عبد الله بن طاهر) کەلەلایەن (مأمون)ەوە ویلایەتیکی میسری پیسپیردابوو ،تیایدا دەلیّ ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی ورلویژ بە زاناو شارەزایان ودوورکەوتنەوە لە گەندەلی وخزمایەتی و بالبالینی و ..لە ئاینیش تا رادەیەك دیاری کراوە (ان ملك تدوم بالكفر ولا تدوم بالظلم) واتە مەرجی بەردەوامی شارستانیەکان دادگەریە با کافریش بیکا مادام زولم بوو دەڕووخیّ ئەگەر ئەهلی ئاینیش بن،سپینوزا دەلێت لەکۆنەوە (سینکا)ووتویەتی دەسەلاتی توند تەمەنی کورتەو دەسەلاتی میانڕەویش تەمەنی درێژە[136] .

**هەلسەنگاندن:** تا ئێرە جۆرە ڕایەکە لەبارەی شارستانیەکان کە تا ڕادەیەك شارستانی ودەسەلاتی سیاسی جوان لیکجیا نەکراوەتەوە ، ئەو بۆچوونانەی سەروو و مردنی شارستانی و(دورە الحچارات)دەشیّ بۆ سیستەمی شارستانی کۆن ،بەلام بۆ سیستەمی شارستانی ئیستا ناگونجیّ ، ڕەنگە لەسەردەمی کۆمەلّگەی جیهانی پەرشوو بلاّوی دەبوو ،شارستانیەکان ناسنامەو سروشتی جیّایان هەبووە، راستە جۆرێك لەناو چوون و مردنیان بە خۆوە بینیوە ، بەلاّم ئێستا شارستانی عەولەمە مولّك ومۆرکی یەك لایەنی نیە ، بە فاکتەرو سیستەمیکی سیاسی نەبەستراوەتەوە، کارلێك دەکا لایەکی سەردەکەویّ ولایەکی نزم دەبیّ، تووشی هەورازونشێودەبیّ،بەلام لەکۆتایی چوارپیّچکەی شارستانی لە رۆیشتن وگەشە ناکەویّ ،....... مولّکی هەموو کۆمەلّگە یە،هەروەك (د.محمد حسين هيكل) دەلیّ : الحضارة هي خلاصة النشور البشري فلا هناك حضارة الشرقية او

---

[136] سپینوزا –رساله فی السیاسه واللاهوت ص211

الغربية او حضارة تقدمية وحضارة مختلفة كل قد ساهم مباشرة او غير مباشرة ...[137] زانايەکی تر دەڵێت: (الحضارة تراث مشترك بين جميع الشعب قديما و حديثها, وانها ارث انساني في نمو لا ينقطع, مثل بحر الزاخر المياه والامواج وله روافد عديدة تصب فيه على الرواح, تلك الروائد هي الثقافاة القومية)[138].

شارستانی عەولەمی لە رەگەزە بیٚ ناسنامە بنچینەیەکان پێکهاتووە بەتایبەتی (زانست)کە بیٚ ناسنامەیەو مولکی هەموو کۆمەڵە,دەشیٚ فەرهەنگ ونەریتوناسنامەی تری تایبەتی لەناوبچیٚ ،مادام مولکی تایبەتە ،بەلام شارستانی لە مولکی تایبەتی دەرچوە ،ڕەنگە لایەك زیاتر زال بن بەلام مولکی گشتیە ، بۆیە دارمانی سیستەمێکی سیاسی جیهانی یان ئیمبراتۆریەتێك ئەو شارستانیە تێك ناچیٚ ، هەر بە نموونە لەو ماوە کورتە بنیاتی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیاوعوسمانی, لەدوای ئەویش یەکێتی سۆڤیەت تێك رووخاو شارستانی هەروەك خۆیەتی, بەهەمان شێوەش ئەگەر بەیانی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکی تێك بروخیٚ ئەو شارستانیە ی جیهانی تێك ناروخیٚ ،هەر بەردەوام گەشەی خۆی دەکا زانست و تەکنۆلۆجیا هەر گەشە دەکەن ،چونکە تەنیا ئەمریکا خاوەنی نیە ....

لەوانەی سەروو بۆمان دەردەکەویٚ کە (شارستانی پێشوو)وەك تاك گەشە دەکاو دەمریٚ، چونکە مووڵکی گشتی نەبووە، لە جیٚهانیٚکی پارچە پارچەکراو لیٚك دابڕاو بووە, تائیٚرە بۆچوونەکانی لە مردنی شارستانیەکان بە تایبەتی (ابن خلدون, توینبی)لەو بارەیەوە راستە, بەڵام لەدوای بەرێکەوتنی عەولەمە لەسەدەکانی دوای (17-18)ئەو بۆچوونەی (دورة الحضارات- )کۆتایی دیٚت و جیهان بەرەو یەك ماکیٚنە دەڕوا، بۆیە شارستانی نامریٚ وەك جووڵانەوەی کۆمەڵی لیٚ دیٚت تاك تاك دەمرن ودەژین, نویٚ دیٚت کۆن دەڕوات بەڵام لاشەگەورەکەی شارستانی بەردەوام دەبیٚت کە مووڵکی گشتییە, موڵکی هەموو کۆمەڵە.

---

[137]د محمد حسين هيكل- الحضارتين الشرق والغرب

[138]محمد عزيز الجبار- الحضارة الأنسانية والحضارية التصنيع

## چارەنوسی شارستانی

ئەو شارستانیەی ئیستای جیهان جیایە لەگەل سیستەمی سیاسی ونەریت وکەلتورو فەرهەنگە تایبەتیەکان ،لەهەمان کات جیاشە لە هەرچوار مەدرەسە(لیبرالی-سۆشیالیستی-شیوعی-ئاینی) ، دەشیٚ سیستەم ومەدرەسەو لیرەو لەویٚ یان هەندیٚ سیستەمی جیهانی بگۆڕی، مەدرەسە ،سیستەم ،بینای سیاسی ..دەگۆڕیٚ ودەکەوی بەلام شارستانی ناکەویٚ ،هەتا ئەگەر بە (گریمانە) بشکەویت وهیچ شارستانی نەمینی زۆر بە خیرایی گەشە دەکاتەوە، (ئەلمانیا بە نمونە)ی چۆن ویران بوو لەجەنگی جیهانی دوەم چەند بەخیراییەوە گەیشتە ئەو ئاستەی ،ئەگەر شارستانی ئیستا ویران بیٚت هەمان ئەو شارستانیەی ئیستا کە بە 6000سال دروست بوە بە کەمتر لەیەك سەدە دروست دەبیٚتەوە ،چونکە ئاستی پیشکەوتن وادەخوازیٚ ،پەیوەست نیە بە سیستەم وئاین ومەدرەسەیەك ،بۆیەدەبیٚ پاریزگاری لە شارستانی جیهانی بکریت وەك دەسکەوتیکی بەشەری ،لەگەل هەمو ئەو سەلبیاتانەشی مولکی گشتیەو بەدارِمانی یان نەمانی تەواوی ژیانی کۆمەلگە دەکەویٚتە مەترسی .

هەندیٚ لە توندڕەوانی مارکسی و ئاینی لە هەندی خال لیك نزیك دەبنەوە سەبارەت بە چارەنوسی شارستانی ،بەشیك لە مارکسی پیٚیان وایە لە پیناو پەیڕەو کردنی شیوعیەت دەبیٚ تەواوی ئەو شارستانیەی ئیستا تیك بڕووخیٚنی ، باکۆنین خاوەنی دروشمی (تحطیم کل ماهو القائم خیر)،لەلای ئاینیەکان بەتایبەتی ئیسلامی جۆرە تیڕوانینیکی تری هەیە ،بەشیکیان دەلیٚن مادام ئیمە پیشڕەو نین ،دەبیٚ ئەو شارستانیە هەلوەشیٚتەوە ، (نصر محمد عارف )دەلّی شارستانی لە ئیسلامدا مانای( الحضور والشهادة ):ئامادەی ئیٚستاو پیٚشرەوەی)[139] (واتە ئامادەیی تواناکانی کات وپیٚشەنگی, خەلّك لە سایەی ئەوەوە ئالاّ هەلّگرین نەك دواکەون، تەياریکی ئیسلامیش هەمان ڕای هەیە ،کەبە (تەیاری سییەم) پۆلین دەکریت ،ئەو بۆچوونەی هەیە بەرامبەر شارستانی رۆژئاوا (بڕوانە ئیدارە التوحش) ،هەندی لای تریش هەن دژی تەواوی شارستانین وەك دروشمە بەدەویەکە پیٚیان وایە ئەو شارستانیەو گەندەلی پیکەوە هاتون .

---

[139] الحضارة- الثقافة- المدنية ص59

ئەوەی شارستانی لاواز دەکا ئاڕاستەکەیەتی و ئەویش دەوەستێتە سەر ئەوەی کێ ڕابەرایەتی دەکات ؟کام مەدرەسە؟ کام سیستەم؟ بەکورتیەکەی زال بوونی ئاڕستەی مادیە بەسەر مرۆڤایەتیەکەی ،یان نەبوونی دادگەریە کە تاڕادەیەك بە زەحمەت دێتە دی چونکە شارستانی ئیستا لەگەل عەولەمەو سیستەمی سەرمایەداری ورژێمی دەولی وعەلمانیەت تێك ئالاوە ،لەوەوە کۆتایی میژوو خرایە ئەستۆی سیستەمی سەرمایەداری (نەزەریەکەی هینتگتۆن) ،ئەوانە وای لە هەندیك کردوە بیر لە هەلوەشانەوەی تەواوی شارستانی کردوە .

لەبەرامبەردا تیۆری پیچەوانە هەیەو هەبوە ، لە مارکسی وتەواوی شیوعیەت بنەمای(حتمیة التأريخية) هەیەکۆمەلێك یاسای کۆمەلایەتی و زانستی و فلسفی و سروشتی بۆ داتاشیبووکە میژوو لەسیستەمی ناسەرمایەداری کۆتایی دێت ، هەروەك (لینین لە کتبی ئیمپریالیزم بالآترین خالّی سەرمایەداری)وای گوزارش کردوە کە لەدوای سەرمایەداری ئینجا کۆتایی میژوو لە شیوعیەت دێت، ئەوە کۆتاییە هەروەك (ستالین) دوای سەرەتای کۆتایی بەو شۆرش و قەیرانەکان هێنا، لە هەندێ رێنمایی تایبەتی خۆیان کۆتایی سەدەی بیستەم کۆتایی سەرمایەداری بوو، بەلاّم دەرنەچوو ، (ناپیۆل)یش (کۆتایی میژوو)ەکی دیاری کردبوو ئەویش دەرنەچوو ، هنری لوڤاڤر کتیبیکی نوسی بەناوی(نهايه التاريخ) بەو ناوەڕۆکەی ئەویش دەرنەچوو ، ئەو جۆرە کۆتایانە لە زۆر لای تر هاتوون:,هیگلّ : کۆتایی میژوو لە ئاریایەتی وئەلمان, مارکس لە برولیتیا وشیوعیەت، زایۆنیەکان لە **(شعب الله المختار),** هەریەکە لە (هال ليندرس)و(مولويل) بەکۆتایی مێژوو دادەنرێت لەسەر دەستی یهودی. نەتەوە عەرەبەکانلە(**خير الامه -العربيه)** . . زۆری تر

هەندێ ڕێسای تر دیاری کراوە بۆ سەرەتای شارستانی،هەلبەتە لە سەرەتا عادەتەن وایە بوهارەکەی سەوزە ،زانستێکی بە ویژدان ،بە دادگەری وپیشکەوتن،برایەتی وپسپۆری ،هاوسەنگی مادی وروحی، گۆشەی تەسکی چینایەتی ..بەلام دوای ئەو نیشانانەی پیچەوانەی لێ پەیدا دەبێت ، دەبتەٚ بنەمای پیشبینی رووخانی شارستانی کە بۆ (غاندی )دەگێڕنەوە بریتین لە : (السياسة بلا مبادئ، والمتعة بلا ضمير، الثروة بلا عمل، والمعرفة بلا قيم، والتجارة بلا أخلاق، والعلم بلا إنسانية، والعبادة بلا تضحيە) ، ئەوانە ئامادەن لە شارستانی ئەو سەردەمە ، پیشووتریش هەریەکە لە هیگل ومارکس بە

هۆی بنەمای (ناكۆكی) هیچ دەزگایەك مانەوەی پیرۆز نەماو دەبێ بگۆڕدرێن ،لەلایەكی تریشەوە نەزەریەیەكی دانیشتوان هەیە دیسان پیشبینی ڕووخانی شارستانی بەجۆریكی تر دەكات ،مالتۆس دەلێ دانیشتوان بە پێی متوالیەی ئەندازەیی زیاد دەكات 2, 4, 8و16,... كەچی بەرهەم (خواردەمەنی)بە متوالیەی حیسابی زیاد دەكات 2و4و6... بۆیە لە كۆتاییدا كارەسات و جەنگو كۆتایی مێژوو نەهامەتی مرۆڤ ویرانی شارستانی لە سەر زەوی ڕوودەدات...،ئەوانەو هەندێ پاساوی ترن بوویتە مادەی معارەزە بوون لەعەولەمە كە هەمان شێوە دژی ئەو شارستیانەشن .

لەو ڕووەوە (روپ ليندك)پالپشتی ئەو بۆچوونە دەكاو دەیەوێ وەك قورئان بلێ (ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ)دەلێ: (بەد ڕەوشتی)و زوڵمو بێ دادگەری و ناهاوسەنگی شارستانیەكان دەپووكێنێتەوە ،بەو ڕوانگە هەندی شارستانی بە (حضارة المتكاملة)و (حضارة الناقصة)دەردەكەوێ ، نموونە بە شارستانیەك دەهێنینەوە لە كەنەدا بەناوی(شارستانی كواكیوتل) لەسەر بەد ڕەوشتی و توندی و نادادگەری بنیات نرابوو و نەما ،بە پیچەوانەش نموونە بە شارستانی هۆزی (پۆیبلۆ)لە نیو مكسیكۆی ئەمریكا دەیهێنێتەوە ،كە لەسەر بنەمای میان ڕەوی لە هەموو بوارێكدا بوو كە پێی دەووترا (بنەمای ئەپۆلۆنی) دریژەی كیشا ، هەرچەندە ئەوە نموونەیەكی بە دەگمەنی دەسكەوتووە بەلام نموونەی پێغەمبەرەكان و درێژكراوەی شارستانی ئەوان پڕە لە مێژوو واقیع، بەو دەروازەیە دەچینە نێو هەلویستی ئاینی بۆ چارەنوسی شارستانی ، ئەسلی هاتنی مرۆڤ بۆ بەرپاكردنی شارستانیە (.واستعمركم فيها) ،جاران (دار الصناعة ودار السفن ودار القطن ..) هەبوو ، تەنانەت لە ناوەندە تەسەوفیەكانیش كە دوورن لە قوولبوونەوەو بیرو شارستانی كەچی لە(كتاب المواقف - ئەو كتیبە هی نفیریە دەلێ ئەو بۆچوونانەم لە خواوە پیگەیشتوە بەشەو پیم دەلێن ):وقال لی امضی لامری اذا امرتك ولاتسألنی عن علمه كذلك اهل حضری من الملائكة العزائم لما امروا به ولايعقبون ،فأمضی ولاتعقب تكن منی وانا منك[140] ، لەو كتیبە دەردەكەوێ كەكاری خوایش لەناو فریشتەكان بە شارستانیانە وەسف كردوە ومەمەملەكەتی خۆی بە شارستانی دیاری كردوە .

---

[140] كتاب المواقف والمخاطبات —محمدبن اكل النفيرى —الموقف رقم14 ص29

دوای ململانێیەکی نەخوازراو بەرەی بیرو فکرو فلسفەو زانست وتەکنیك و شارستانی شکستی هێنا ،ئیتر علومی شەرعی ماناکانی تەسك بۆیەوە بۆ فقهی ئەحوال شەخسی و هەولێکی زۆر درا کە بلێن ئاین ئەوەندەیە،وای کردسپینۆزا بلێت (ئەرکی فلسفە دۆزینەوەی هەقەو ئەرکی ئاینیش بەندایەتی)[141]، هەم قازانجی هەندێ فەقیە لەوەبوو هەم قازانجی دژە ئاینەکانیش لەوە بوو کە ئاین دوور بخرێتەوە لە زانست و فکرو فلسفەو تەکنۆلۆجیاو شارستانی ،تەنانەت بۆ داگیر کردن ویەخ کردن وگەوجاندن وبەرگری نەکردنی ئیستعماریش لەوەوە زاراوەی(international caltivation analisis– شێکردنەوەی فەرهەنگی گەلان )[142]بە مانای تەقەلای ئیستعماری سەقافی بۆزال بوون بەسەر فەرهەنگی تر و داگیرکراو .

ئەو کاتی بەشیك لە دەسەلاتی خەلافەتیش بەشدار بوو لەو دور خستنەوەیە ،ئەوە تا ئیستاش هەر دووری دەخەنەوە هەتا دەسەلاتی سیاسی ودەولەت وسیاسەت ،یان بەمانایەکی تر دووری دەخەنەوە لە تەواوی ژیان وئەوکاتی مانای ئاین ئەوەیە لە نێوان خۆت وخوای خۆت وەك پرسیکی کەسی[143] ،لەوەوە جیهانی ئیسلامی لەشارستانی دوور کەوتەوە وئیستا هەرە دواکەوتوەکەیانە ،تەنها پاشکۆی جیهانە .

لەو هەلویستە فقهیە گەرانەوە بوو بۆ هەندێ نەریتی ئەعرابی ونەفامی و ڕێسای (اذا العرب تحضرو تفسدوا) ئەوە نەریتی عربی ڕەسەن بوو دوور بوولەشارستانی ،سەرەنجامێکی لۆجیکیە ئیستا لە دواوە بن ،شاعیریکی ئەمریکی(کەلە تاریخ فلسفە الامریکیە وەرگیراوە) هاوشیوەی ئەو ڕیسا بەدەویە لەدژی دیموکراسی دەلیت : ایتها العاهره القادمه من عصور الفاسده ..ومن نشأه خاسره...خیر لك ان تشعری بالقیودمن ان تفسدی العالم اجمع ...[144]

---

[141] سبینوزا –رسالة فی الاهوت والسیاسة ص363

[142] الموسوعة المیسرة للمصطلحات السیاسیة ص93

[143] دەگۆترێ یەکەم کەس کە بانگیشەی وای کرد(ئاین پرسیکی کەسێتیە) مارتن لۆتەر بوو لە چوارچێوەی چاکسازی ئاینی لەدژی گەندەلی پیاوانی ئاینی .

[144] محمدالاحمری –الدیمقراطیة (الجذور واشکالیة التطبیق) ص53

ئاینەکانی تر هەرچەندە بە ئەندازەی ئاینی ئیسلام ئەو رۆحەی نەمابوو کەچی بەجۆری تر چارەسەریان کردبوو ئەوان پیشکەوتن وجیهانی ئیسلامیش دواکەوتن ، لە تلمۆدی یەهودی بەشیکی تەرخان کردبوو بۆ کیمیاو فیزیاو تکنۆلۆجیاو زانست وشارستانی ، لەلایەن مسیحیش کۆمەلەی کویکەرز دامەزریٚنرا بۆ تویٚژینەوەی زانستی زۆر پیش سەدەی 17 ﷴ، ناوی کۆمەلەی (کویکرز)لەگەل گەشەی زانستی وئاینی وشارستانی پیکەوە دیت...، ئەو کۆمەلە زۆر لەکۆنەوە ، ڕۆلی گرنگیان لە سەرهەلدانی شارستانی وپیشکەوتنی تکنۆلۆجیای رۆژئاوا بینیوە ، لە سەدەی 11 و12 چەندین زانکۆیان کردۆتەوە ، لەو زانایانەی ناویان هاتوە ( ئەگناتیۆس لە ئیسپانیا لەسالی 1540 ئنجا تۆمائەکوینی کە زانستەکانی گەردوونی مەجەستی کردە بەشیك لە عقیدەی مسیحی ..ئنجاناوی هەریەکەلە: فیرما، هیگنز ، *نیوتن* ،ویلسون بیکر،فان هیلموت، کاسبر ویستار ،توماس یونج، فردریك سانغر، جوزیف تایلور، جوسلین بیل بورنیل، ،جون دالتون، توماس هودجکن، کاپلین نسدیل، پرستانلی إدنغتون، ماریو کابیکی...)تەنانەت هەندیکیشیان مسیحیش نین یارمەتیدەر بووینە ،لەوانە: (جون ل.هلبرون، ودیفید ليندبرغ، ئیدوارد غرانت، توماس گولدشتاین، وتید دیفیس،..)بەو شیٚوەیە ئەوانە بووینە خاوەن شارستانی ، لەژێر سایەی ئەو جۆرە فقهەی جیهانی ئیسلامی بە موقەدەس وەریگرتوە نە شارستانی بەرپا دەکریٚت نە پیشڕەویش دەبن ،زیاتر لەوەش بەشیکی زۆری لەو فقهە دژی عەقل ەبیرکردنەوەو فلسفەو کیمیاو فیزیاو تەکنیك بوە .

لە پیٚناوی زامن کردنی پیشڕەویکی شارستانی وادەخوازی کە فقهی ئاینی لەسەر تەنیشت راستکەیەوە سەر پیٚی خۆی ، مەبەستی بنچینەیی ئاینی بهیٚنیە دی کە بەرپاکردنی شارستانیە ، ئەویش بە دوو هەنگاوی پیچەوانەی یەکتر تەواو کەر، لەلایەك قەلاچۆی ئەو بیرە شازانەی ڕیٚگرن و عەقلانیەت وبیرکردنەوەو قوول بونەوەو گرنگی دان بە زانست وزانیاری وفکرو حیکمەت و پیشەسازی وشارستانی بە تاوانی تیٚرۆر هەژماردەکا ،لە هەمان کات بینای فقهیکی نوێی ڕەسەن دابریٚژریٚ تایدا ئەو خویندنانە کرۆکی عیبادەت هەژماربکریٚت .

---

[145] لة (موسوعة مصطلحات النقدية ج1ص404هاتوە کەلەسەدەی 17 ڕا دەست بەکاربووینە ،بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە زۆر پیشووتر بووینە .

(4)

## 4- ئاشتی السلام Peace

**ئەوانە دەگریتەوە ( ئەهلی قەلەم –ئەهلی سەیف– پاسفیزم - صقور–حمائم ، باندۆرا،ئیبلیس، ستایگراهـ، (تعایش السلمی) ، (مجلس السلم العالمی)، دیاپۆلۆس، کینگۆ،لاکیش،ڤیدا ،ئەمفکتۆنی،مانۆ،..)**

زاراوەیەکی ڕەسەنی ئاینیە پیچەوانەکەی شەڕوجەنگ وناکۆکیە،ئەگەر ئاین نەبوایە ئەوە وەك چۆن بەیەککەیشتنی ئاژەلە دڕندەکان پیکدادان بوو ئاواش مرۆڤەکان پێکیان دادەدا،بەیەککەیشتنی مرۆڤ بە ئالوگۆڕی ئاشتی (سلام علیك) دەست پیدەکا ،ئیستاش دەروازەی بەیەك گەیشتنی مرۆڤ بە (السلام –ئاشتی )دەست پێدەکا ،بۆیەش ئاشتی چەمکیکی ڕەسەنی هەمو میلەتانە ، رەهەندی ئاشتی لە شارستانیە کۆنەکانەکانیش بە ڕوونی دەردەکەوێ ، لەسەردەمی هند ناوی بوزا بە ئاشتیخوازو کتیبەکانی (ڤیدا ومانۆ) رەهەندی ئاشتی تیدابوە،زەردشت لە شارستانی عەجەمی وکوردی وبانگەوازیە ئاشتیەکانی،شارستانی سۆمەری بە ئاشتی (لاکیش)بەناوبانگن لە 2100پ ز ،جاریش وایە دەگۆترێ یەکەم جار ووشەی ئازادی لەو سەردەمی هاتوە هاوتای ئاشتی، لەسەردەمی کۆنفیشیۆسی بۆ چینیەکان ،حوکمی فرعەونەکانی میسر ڕوون تر بنەمای ئاشتیان لەگەل دراوسێ دیاری کردوە ،.. لەسەردەمی رۆمانی وئەگریکی ئەنجومەنیك هەبوو بەناوی (ئەمفکتۆنی)بۆ چارەی کیشەی دەسەلاتەکانی شارەجیاجیاکان وبەرقراری ئاشتی ،یاری ئۆلمپیاش کرابوە ئامرازیکی تری ئاشتی هەر چوار سال جاریك هەموی کۆدەکردنەوە لەو فەترەیە شەڕوهەلگرتنی چەك قەدەغە دەکرا لە شیوەی (مانگە حرامەکانی شەڕ) ،لەسەر ئاستی جیهانیش بنەمایەك بە ناوی (ئاشتی رۆمانی) توانی 2سەدە ئاشتی دابین بکات لە 72پ ز تا 180ز،..هەموو ئاینەکان بنەمای بنچینەییان ئاین بوە ،وا پیدەچی رەهەندی ئاشتی لەو شارستانیە کۆنانە لە ئاین هاتبیت .

**ئاشتی وئاشتەوایی وئارامی لێكجیان ،مەرج نیە هەمو ئارامیەك ئاشتی بێت ،زۆر جاریش ئاشتی كاتی ئاشتەوایی پێووتراوە ،كە فاكتەڕی شەڕئامادەیە لەواقعێكی بەڕواڵەت ئاشتی .**

**بنەچەی زمانەوانی وپێناسی:** ئاشتی لە ئاشتەوایی هاتوە بەمانای كۆتایی هێنان بە جەنگ وناكۆكی،بەعربی(سلام)بەعبری(شالوم)وبەلاتینی(PAX)بەیۆنانی(eiréné)وبە ئینگلیزی ( PEACE ) بە فرنسی(PAIX) بە زمانی روسی безопасност..،لە بنەچەدا ووشەی (سلام)بەو درەختانە ووتراوە كە هیچ دڕكی پیوەنیەو هەر ەسەوزیش دەمێنێتەوە[146]، (سەلامە)ش بەمانای بیخەوش[147]، لە قورئان 40جار ئەو ووشەیە هاتوە ،273جاریش لە تەورات هاتوە ،101 جاریش لە ئینجیل هاتوە[148]، زۆر جۆرە هێما بۆ ئاشتی ، كراوە،ڕەنگێكی سپی پێدەدرێ پیچەوانەی ڕەنگی سوركە زیاتر بۆ جەنگ ومەترسی بەكاردێت ،هێلی تەلەفۆنی نێوان مۆسكۆ و واشنتن (كەلە ئەیلولی 1963 دەست بەكاربوە )ناوی هیلی سوری لێنرابوو ، لە هەموان فراوانتر نیشانەی ئاشتی بە كۆترێك ولقە زەیتونیكی بە دەندووكی وەیە گوزارش دەكرێ كە لە بنەچەدا دەگەڕیتەوە بۆ سەردەمی (ح نوح) كاتێ بۆ جاری چەندەم ئەو كۆترەی دەنارد ئەو جارە ئەو لقە زەیتونەی لەگەڵ خۆی هینابۆوە نیشانەی دابەزینی ئاستی ئاوی تۆفانەكەیە . بە حوكمی ئاوا ڕەسەنی لە میژووی میلەتان و ڕەسەن بوونی لە ئاین و مەبادیئە مرۆییەكان بە ئەندازەی چەمكەكانی تر كیشەی پیناسی جیاجیای نیە ،هەندێكی لێ هەلدەبژیرین :

+جرجانی : زیاتر بەلای دوارۆژداچوەومانای سەلامەتی لە ئایندەو رۆژی دوایی داوە[149] .

+راغب (مفردات)وابن فارس (معجم مقایس اللغە) وابن مەنزور(لسان العرب) ئیبن كەسیر(النهایە) : ئاشتی مانای (سولح)

---

[146] موجز دائره معارف اسلامیه ص5739 هەروەها (لسان العرب – ماده:س ل م) .

[147] محمدفریدالوجدی –دائره المعارف قرن عشرین ج5ص340.

[148] هەموی خۆمان لەو مەوسوعەیە پێیهەلساوین بەو دۆزینەوانە.

[149] التعریفات –جرجانی ص70

+مەوسوعەی ستانفۆردی فلسفی : پابەندی بە ئاشتی مەبدەئیانە دژایەتی جەنگ ،دەقەکەی ( Pacifism is a commitment to peace and opposition to war ) [150].

+ فەرهەنگی سیاسی (ئارشی فارسی) ل130 : پاسیفیزم بەمانای ئەوانەی ئاشتی و سولحیان دەویت ،دژی شەڕخوازی.

+الموسوعة الميسرة : السلام حالة من الامن والاستقراروالتفاهم ..[151]

+ بەشیکی تر پێیان وایە پابەندی بە ئاشتی ودژایەتی جەنگ بە دروست کردنی حکومەتیکی جیهانی'World government' دیتەدی ،جاروایەبەو دۆخە دەڵێن کۆسمۆپۆلۆتی .

+پیناسی (یۆنیسکۆ) کە لەکۆنگرەی سالی 1989 ی(السلام فی عقولالرجال) بۆ ئاشتی وەستابوە سەر 3 بنەما (ئازادی –دادگەری-یەکسانی نیوان هەردوو رەگەز) .

+پیناسە دەستوریەکان -(دستور جمهورية مصر العربية – 1971 - وثيقة إعلان الدستور)-السلام لعالمنا: عن تصميم بأن السلام لا يقوم إلا على العدل وبأن التقدم السياسي والاجتماعي لكل الشعوب لا يمكن أن يجرى أو يتم إلا بحرية هذه الشعوب وبإرادتها المستقلة، وبأن أي حضارة لا يمكن أن تستحق اسما إلا مبراة من نظام الاستغلال مهما كانت صوره وألوانه.

+ قاموس الكتاب المقدس : ئاشتی بریتیە لە ئاسایش وئارامی ودوورکەوتنەوە لە جەنگ .

سەربردەی ئاشتی :

نەستەقیکی کۆن هەیە دەلێت ئەگەر یەك کەس لەجیهان هەبێت ئەوا ئاشتی بەرقرار بوو ،ئەگەر بوونە دوو ئاشتی تێکچوو وجەنگ دەبێتە ئەسل ،ئەگەر بوە سێ و زیاتر ئەوا پیلانی دوو دژبە سێیەم دروست دەبێت ،هەر بەوئارِستەیە هەندی ئاین و مەدرەسە پێیان وایە شەڕ بە میرات بۆ مرۆڤ لە ح ئادەم بۆی ماوەتەوە بەهۆی ئەو هەلەیەی کردوویەتی،ئاشتی لێسەنراوە، لەوانە (کانت) ئەو ڕایەی لە

---

[150] Stanford Encyclopedia of Philosophy - article: peace-

[151] الموسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية ص238

کتیبی (الدین والغایه الوحیده) باس کردوه[152] ،هەربۆیەش لەیەکەم نەوەی ئادەم گەورەترین شەڕ ڕویدا، واتە پەیوەندی بەشەری دژایەتیە نەك ئاشتی وتەبایی وهاریکاری ،دەیەوێ بڵێ دواجار میژوو و واقیع خەملیون بە پێی ململانێ وشەڕ نەك ئاشتی ، ئەو ڕایە بە توندی لای مارکسیەت قۆسترایتەوە وبوویتە ئەسلیکی بنچینەییان وپێیان وایە ئەوەی کۆمەلگەو سروشت وگەردوونی ڕاگرتوە شەڕوململانێیە..لەگەل زۆر ڕای تر کە نا(ئاشتی) بە ئەسل هەژماردەکەن ،زۆری تریش پیچەوانەی ئەوانە ئاشتی بە ئەسل هەژماردەکا، رۆسۆ دەلێ: ئەو بوونەوەرەی خودا بە رژیمە ، ئاشتی لە رژیمەو شەڕلە فەوزایە ،کەواتە ئەوە مرۆڤ خۆی شەڕ دروستدەکات نەك بۆی هاتبێت[153]،(فطری نیەومیراتیش نیەو سزای خواییش نیە بۆمرۆڤ وەك هۆبزونیتچەو وجودیەکانیش وادەلێن ، شەڕو زولمیش جمکن .

ئاشتی ناناسرێ بەبێ ئاوێنەی جەنگ ، جەنگیش ڕیشەی قوولە بەمیژوو ، مادام ڕەهەندیکی گرنگی ناخی مرۆڤ بیت ،بۆیەش نامۆیی نیە ئەگەر بڵێین یەکەم تێکچوونی ئاشتی لە جەنگی نیوان قابیل وهابیل هات، ئەو چەمکانەی ئیستا بە ئەرینی پۆلین دەکریت لە میژووی مرۆڤایەتی گەلێ جار بە نەرینی پیشاندراون ،وەك چۆن دیموکراسی لەو سەردەمی بۆ ترسنۆکان بوە ئاواش ئاشتی بۆ هەژارو بیهیزان بوە ، جەنگ ودژە ئاشتی زیاتر پانتایی میژووی پڕکردۆتەوە میژوو زیاتر جەنگاویە،لەناو میلەتان زیاتر ناوی کوڕان بە شەڕهاتوە یەکێ لەوان(نیلسۆن ماندیلا)لە بنەچەدا ناوی (ڕۆلیهلالا)بوە بەمانای شەڕانی[154]،ناوی کوردیش شیرکۆ وشیرزاد و ناوی ئەو ئاژەلانەی زیاتر شەڕاوین باوی هەیە ،لە بزوتنەوە شۆڕشگێریەکانیش پلنگەکانی تامیل وتیمساحەکانی ئەفریقاو شیرەکانی ئەفغانستان وپیشمەرگە (لەکوردستان بە گورگەکان ناودەبران لە سالانی 1976تا 1979) ،بۆیەش خوای جەنگی گەلێ زیاترە لەخواوەندیەکانی ئاشتی وەك لە خواروو زیاتری باس دەکەین ، هەرخودی مرۆڤ لە ئەنجامی شەڕ هاتۆتە کایەوە بەپێی ئەفسانەکان : ئەسلی مرۆڤ شەڕانیە چونکە لە رشتنی خوینی خواوەندی بابلیەکان (کینگۆ) مرۆڤی لیدروست کرا[155] ، ئەوجۆرەڕایانە زیاتر باوی وەرگرتوە

---

[152] داحسان علی الیدری – فلسفة الدین فی الفکر الغربی ص321

[153] روسو- دین الفطرة ص58

[154] ڤۆنیلا لۆندگرین- نیلسۆن ماندیلا – و: فەرهادشاکەلی ل8 ول122

[155] قاموس الخرافات ص189

،بەشیك پێیان وایە میژوو واتە میژووی جەنگ ،( سیر کریسی) لە نیوان (485 پ ز تا1815 )15 جەنگی جیهانی دیاری کردوە، پێی وایە ئەوانە دیزاینی جیهانیان دیاری کردوە ، جەنگەکان: (ماراسۆن(490پ ز)،سیراقۆسە413پ ز ،اربیلا331پ ز ،میتۆرس207 پ ز تیۆتۆبج9 زکاتەلۆن451ز ،تۆر732ز سنلاك1066 ز، ئۆرلیت1429ز ،ئەمارد 1588ز ،بلنهایم1704ز، تاڤا1709ز ،ساراتۆجا1777ز ،فالمی1792واترلۆ1815ز[156]، **دەلێن سەرجەم 345000جەنگی بچوك وگەورە کراوە لەمێژوو ، زیانی جەنگ وئەو هەموسوپایە لەلایەك ،لەلایەکی تر قازانجی ئاشتی** هەربەراورد ناکرێت ،لەو ساتەش ئەو هەمو بودجەی لە سوپا سەرف دەکرێت بەشی هەمو هەژارانی جیهان دەکات .

جاران وەك نەریتی دەولی شرعیەت بە جەنگ درابوو بۆ یەکلا کردنەوەی کیشەکان ، تیایدا سەرکەوتن دەبوە دادگا، بەو شێوەیە نەك لە مەیدان هەتالە ئاستی فکری ومەدەنیەتیش تا کۆتایی سەدەی 19 هەر فەرهەنگی جەنگاوەران زال بوە بەسەر فەرهەنگی ئاشتیخوازان، هەتا یەکگرتن ولیکنزیك بوونەوەش لە پیناو جەنگ بوە ،تەنانەت زۆر جارلەژێر دروشمی ئاشتی خۆبۆ جەنگ ئامادەکراوە ئیستا ئەوروپا کیشوەرێکی ئاشتی ترە لە کیشوەرەکانی تر،بەلام لە بنەچەدا بە نیازی شەڕانی هاتۆتە دی، یەکەم تەقەلا لەسەردەمی شارلمان(بەدامەزرێنەری فرنسا هەژمار دەکرێت) لە دەوروبەری 800ز پاپاش تاجی خستە سەر سەری نەك لەبەر ئاشتی بەلکو بۆ ئامادەکاری جەنگ دژبە جیهانی ئیسلامی ئەوسا [157] ،ئاشتی وەك بنەمایەکی مرۆڤانە بەدرەنگەوە گەیشتۆتە رۆژئاوا، ئۆلیڤەر کیرجن دەلێ یەکەم جار ئاشتی سیاسی لە رۆژئاوا دەگەڕیتەوە بۆ 28/جولای/1919 لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم (1914-

---

[156] الموسوعة الميسرة ص3169 .

[157]بروانة: أ- العلاقات السياسية الدولية ص10 ب- جمهورية افلاطون، مقدمة.

[157] د محمدبازیانی – مفهوم السلم فی الفکر الاسلامی ص14 .

1918)[158]،دوای ئەو هەنگاوانە کۆنگرەکـانی ئاشـتی دیـت و سیسـتەمیکی نـویی جیهـانی بەهۆی دروست بوونی (کۆمەلەی گەلان ) هاتە کایەوە، بەلام لەلایـەکی تـر بـە پێـی سەرچـاوە ئەکادیمیەکان یەکەم جار (ئەمیل ئەرنۆلد)ی فرنسـی لـە 1901 (ئاشـتی) لـە خشـتەی کـاری کۆنگرەی دەیەمی ئاشتی لە ئوسکوتلندا دانا،لەوێ باس لە چارەی ئاشتیانەی کیشـەکان کـرا بە پیی یاسای دەولی نەك چارەی سەربازی ، سەرەڕای ئەو دووبۆچوونە زۆر لەپیشوو تر (بنەمای ئاشتی)هەبوە وەك ئەسل وەك لەسەروو لە ئاینەکان باسمان کرد،گەورەترین بانگەوازی گـەردوونی بۆ ئاشتی لەو ئایەتەی قورئانی بەدی دەکریت ( يأيها الذين آمنوا ادخلوا في السلم كافة،...)، لە ئینجیلیش: (لو 2: 14): (الْمَجْدُ للهِ فِي الأَعَالِي، وَعَلَى الأَرْضِ السَّلاَمُ، وَبِالنَّاسِ الْمَسَـرَّةُ)، لـە تەوراتیش بەهەمان شێوە : انقذ المظلوم من يد الظالم، ولا تكن صغير النفس في القضاء" (سيراخ 4: 9)،وَيْلٌ لِلْقَائِلِينَ لِلشَّرِّ خَيْرًا وَلِلْخَيْرِ شَرًّا، الْجَاعِلِينَ الظَّلاَمَ نُورًا وَالنُّورَ ظَلاَمًـا، الْجَـاعِلِينَ الْمُـرَّ حُلْـوًا وَالْحُلْـوَ مُـرًّا(سـفر إشـعياء 5: 20)، وَثَمَـرُ الْبِـرِّ يُـزْرَعُ فِـي السَّـلاَمِ مِـنَ الَّـذِينَ يَفْعَلُـونَ السَّلاَمَ(رسالة يعقوب 3: 18)...لە تەوراتیش وا دژی جەنگەو (ورأى الـرب أن شـر الإنسـان قـد كثر في الأرض، وأن كل تصور أفكار قلبه إنما هـو شـرير كـل يـوم... فقـال الـرب أمحـو عـن وجـه الأرض الإنسان الذي خلقته (تكوين5:6،7). وكان الطوفان...، هەتا لەناو ئەو میلەتانەی ئاینی سوڕدراویشیان هەبووبێ هەر ئاشتی ڕەسەن بوە ، ساتران خواوەندیکی کۆنی بابلی وعەجـەم بـوە کە کاری لیککردنەوەی شەڕو بەدادگەریانە سنورەکانی بۆ ئیمپراتۆریەکان ریکخستوە[159]، لە نیو مسیحی ناوی کۆمەلەی (کویکرز) لەگەل گەشەی زانستی وئاشتی پیکەوە دیـت، ئـەو کۆمەلـە زۆر لەکۆنەوە ، ڕۆلی گرنگیان لە سەرهەلدانی شارسـتانی وپیشـکەوتنی تکنۆلۆجیـای ڕۆژئـاوا

[159] قاموس الخرافات ص137

بینیوه ، له سەدەی 11 و12 چەندین زانکۆیان کردۆتەوه ، زاناو بیریاری گەورەی مسیحی تێدا بوه ،بیجگە لەوەش زۆربەی فەیلەسوفەکانیش باسی ئاشتیان کردوه ، ئـەمانوئیل کانـت کتیبـی بەناوی (نحـو السـلام العـالمی )هـەبوو ، لـەدوای جـەنگی سـی سـالەی ئـەوروپی و ریکـەوتنی ویستیفالیا 1548ز زۆر تەقەلای فەرمی ئاشتیانە دراوەو (عائلة الاوروبـی) لی دروسـت بـوو، دوای بووه سیستەمیك هەموو جهانی گرتەوەو دەولەتی عوسمانلیش له سەردەمی سـولتان عبـد المجید لە1856چووه ناویەوه، له نێوان سالانی (1914-1918)ی جەنگی جیهانی یەکـەم لـە بریتانیا نەیارانی ئەو جەنگە ناویان لینرا (ئاشتیخوازان) ئەوانە زۆر پشتیوانیان لە دام ودەزگـای نیودەولەتی دەکرد ،رۆلی گرنگیان هەبوو لە پیکهینانی کۆمەلەی گـەلان لـە 1920 و نەتـەوە یەکگرتوەکان لە 1945، بەهەمان شێوە ئەو 14 بنەمایەی ویلسون لە1918ز ، تالـە سـالی 1924 عەسبەتولئومەم (پرۆتۆکۆلی جنیف) ی گریدا بۆ ئاشتی وتیایدا جەنگ بـەتاوان نـاوزەد کردو بەدیلی جەنگی دارشت دادگای نیودەولەتی[160] . هەرچی نەتـەوە یـەکگرتوەکان لـە پینـاو ئاشتی دروست بووینە تەنانەت بەندی 7 ..بۆ دژی (دژە ئاشتیانە).

دوای سەرهەلدانەوەی جەنگی سارد کۆمەلە وولاتیك هەلسان بە تەقەلای دروست کردنی رێگەی سێیەم ریگەی ئاشتی لە نیوان هەردوو لای وولاتانی سەرمایەداری بەسەرۆکایەتی ئەمریکا ودنیای شیوعیەت بەسەرۆکایەتی سۆڤیەت و لەکۆتایدا وولاتانی بیلایەنی لی بەرجەستە بوو، رۆلی گرنگیان بینی لەدژایەتی زیادکردنی چەکی کوشندەو بوە دروشمی کۆنگرەی وولاتانی بیلایەن(عدم الانحیاز)[161]، بەشیکی تر میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان بە یەکەم بەلگەنامەی نیودەولەتی فەرمی هەژماردەکرێ کە ئاشتی جیهانی بەرقەرار بکات ، لەو میساقە (50) جارناوی ئاشتی هاتوە .

---

[160] الموسوعه المیسره للمصگلحات ..ص77

[161] احمدعطیة اللة – القاموس السیاسي ط3ص310 .

زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانی سێ یەمیش هەروەك رۆژئاواییەکان نموونەی ئاشتی لە کۆنەوە بە (بوزا) و (مونسو) و (مسیح) و (زینون).. دەهێننەوە وجارجاریش باسی دیباجەکەی یاساکانی حەمورابی دەکەن کەووتویەتی (بوونی خودا دادگەری لەسەر زەوی دەچەسپێنێ وئاشتی بەرقەرار دەکاو بیهێزدەپارێزێ لەهیزدار)، نوێش بە (غاندی) و (جۆن ریسکارت) و (تۆلستۆی) و (هنری داڤید) و (مارتن لۆتەرکنك)، [162].. کەچی ناوی (اخوان المسلمین) نایەت خۆ ئەوان لە هەموان ئاشتیخوازتر بووینە، خۆ (مارتن لۆتەر) و (غاندی)یش رێبەرایەتی نارِەزایی مەدەنیان کردووە هەروەك (أ.خمینی) و شۆڕشی ئێران کەچی ناوی تۆمار ناکەن، رِەنگە لە میژوو نمونەی بەرگری ئاشتیانە زۆربێت بەلام زۆربەی زاناو میژوو ناسان ناوی (غاندی)و تەقەلاکانی رزگاری خوازی دژ بە داگیرکاری بریتانی وەك نمونەی زەق دێت،کە بە بەرگری ئاشتیانە ناوزەد دەکریت بە هندیانە پێی دەووترا(ستایگراها)، لەدوای ئەو ئەو بزاڤە مەدەنیەی لە پەنجاکانی سەدەی 20 مارتن لۆتەر کنگ لە ئەمریکا بەرپا بوو ، ئەگەر چی پیشوو خەلات دەدرا باشترین جەنگاوەر ئیستاچەندین جۆرە خەلاتی ئاشتی سالانە بەوانە دەدریت کە ئاشتیخوازن ،لەوانە: **خەلاتی نۆبلی ئاشتی ،خەلاتی غاندی بۆ ئاشتی ،...**

<u>ئاشتی لە نێوان ئاین وئاینپەروەران:</u> لەو سەردەمە تووەتیکی زۆر هەیە بەرامبەر ئاین و دەلێن ئاین وئاشتی هاوتای یەك نین ، کەچی بە رِای سیکیۆلاریکی توندە وەك (هۆبز)یش ئەسلی ئاشتی لە ئاین هاتوە[163] ، بیجگە لەوەش لەوەی سەروو دەرکەوت کە ئەسل لە ئاین ئاشتیە بەلام لای کۆمەلگە زیاتر بەرجەستەی جەنگ کراوە وەك ئەسل ، ئەو دەردە گەلێ جار ئاینپەروەرانیشی گرتیتەوەو زیاتر بەلای شەرِوجەنگ بوینە وەك ئەسل نەك ئاشتی ،ئەو ئاینییەروەرانەی زیاتر کەوتونە ژێر کاریگەری ژینگەی کۆمەلایەتی زیاتر لە ئاشتی دوور کەوتونەوە ،ئەوانەی لە پەیام نزیك بووینەوە بەو ئەندازە لە ئاشتی نزیك بووینەوە ، ئەو رِێسایە زیاتر فقه دەگرێتەوە ،ئەو فقهانەی لە ژێر کاریگەری کۆمەلایەتی بووبن جەنگ شانازی و ئەسل بوە ,ئەوەی زیاتریش لە پەیام نزیك

---

[162] (الموسوعة السياسية (ك-ل-م)ج5 ص385 .

[163] توماس هوبز- اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص119.

بووبیَ ئەوا ئاشتی وشارستانی ومەدەنیەت ئەسل بوە ،کاریگەری کۆمەلایەتی جۆریکە لە جۆرەکانی(لومە الائم)کە قورئان داوای کردوە نەکەونە ژێرکاریگەری ،کەچی زیاتر ئەو کاریگەر ترە،بۆیەش دەبینین پانتایی میژووی کۆمەلگە زیاتر شەڕە نەك ئاشتی ،تا ئەو ڕادە فۆلتیر دەلیَ میژوو بریتیە لە تاوانەکانی بەشەری ،هەروەها (ئەریش فرۆم)یش هاوڕایەو دەلیَ :میژوو گۆڕی فەرهەنگە عەقلانیە مەزنەکانە [164] ، هەر لەو تیڕوانینەش میژوو نوسان زیاتر میژووی جەنگیان نوسیوەتەوە نەك ئاشتی ، تەنانەت لە فلسفەی مارکسیی(زۆری تریش) ناکۆکی لەمیژوودابویتە سەرچاوەی پیشکەوتن و گەشەو پیشکەوتن ، جگە لە ئاین زۆر بەدەگمەن تیڕوانینیك دەبینیەوە کە پێی وابێت بە ئاشتی پیشکەوتن دێتە دی ،لە (الموسوعە المیسرە) ڕای وایە لە ئاشتی ئەوە دێت[165].

ئیتر زەق ترین ڕووداو لەشارستانیەکانی پیش (ح نوح) جەنگە گەورەکەی نێوان قابیل و هابیلە ، لەکاتێکا زۆر لای تری ئاشتی هەبوە ،بەو پێیە یەکەم پیشیلکاری ئاشتیلەوەوە دێت ،بۆیە جاروایە دەگۆتریَ ئەگەر ئاشتی ئەسلی ئاین بووبێت ئەوە جەنگ ئەسلی ئاینپەروەران بوە ، بەدیویکی تر نزیك ترە لەڕاستی ئاشتی گوزارشی کاری عەقلانیەو جەنگیش(جەنگی ناڕەوا) گوزارشی کاری سەرشێتیە ،بۆیە لەکۆنەوە دوو چەمك لیك جیاکرایتەوە ،ئەهلی سەیف وئەهلی قەلەم یەکەمیان شەڕاوی ودوەمیان ئاشتیانە ،ئەودوو چەمکە کۆنە بەلام لەسەردەمی عباسی وەك زاراوەش سەری هەلدا،بەردەوام بوو تا کۆتایی عوسمانیش زیاتر بە دەسەلاتی سیاسی ووتراوە ئەهلی سەیف( شمشیر) و بە زاناو بیرمەندانیش ووتراوە ئەهلی قەلەم ، میژووی ئەهلی قەلەم زیاتر جێی شانازیە ، بۆیە لەسەردەمی ئەمەوی وعەباسی زیاتر ئەهلی سەیف عەرەب بووینەو ئەهلی قەلەم زیاتر عەجەم بووینە ،لە یەکەما زیاتر خوین ڕشتن وتوندوتیژی ولەدوەما شارستانی وفەرهەنگ وئاشتی ، سەروەریەکانی ئیمپراتۆرو کیانەکانی میژوو سەربازی بوە نەك مەدەنی ودادگەری ،هەتا لە میژووی خەلافەتە ئاینیەکانیش ، لە (موسوعە الالقاب)زیاتر نازناوە سەربازی وجەنگیەکان بۆخەلیفەکان دیاری کراون نەك ئاشتی ومەدەنی ،هەتا لە خودی ناوەکانیشیان ، ناو لە(خالد)نراوە( سیف الله المسلول ) ، خوای

---

[164] د علی اکبر ولایتی وسوعە الاسلام وایران ج3ص159

[165] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ..ص238

گەورە پێویستی بە شمشێری کەس نیە ،ڕاستە خالید قارەمان بوو بەلام ئەو وەسفە زیادەڕەوی تێدایە ،بەدرەنگەوە ئەوناوە زیادکراوە ، لە سرودی عوسمانیش ئەو ئەسلە زیاتر دەردەکەوێ ، با ئەو کۆپلەیەی لێهەلبژێرین :

یا خیـر جیش .. یا خیــر عسکـر

أنت الغضنفـــر .. في البحر فاظفر

فـي اليـــد درع .. في اليــد خنجـر

نحـو الأعـادي .. يا خيــر عسكـر

لو كــل شــــيء .. في البحر ينصّر

نحـن ننـادي .. اللــــه أكبــــر

اللـه أكبــر .. اللــــه أكبــــر

جيشنـا فليكــن .. دومــــــاً مظفــر

بە تورکیەکەی:

أى شانلـــى أوردو .. أى شانلى عسكر

ئیتر پەلامارو کوشتار زیاتر ناوناوبانگی ئیمپراتۆرو سولتان وخەلیفەی بەرزکردۆتەوە ، خوین رشتن وسەر بڕین وەك ئەوەی تەیموری لەنگ دەیکرد خۆی لەسەری خەلیفەی موسولمانانی دا ،بە شانازیەوە دەلێت لە ژیانمدا خەلیفەی وا ترسنۆکم نەبینیوە کەلیمدا دوومەتر خوین فیچکەی کرد ، سەری (ح حسین)یان لە عیراقەوە بۆشام بەدیاری برد ،سەری چەندین ئیزیدیان لەسنجارەوە بۆ موسل بردەوە تەنها لەسەر نەدانی باج[166]،تەنانەت (حافیزمحمدپاشا)ی والی موسل لەسالی 1845ز ژن ومندالیشی ئەنفال کردو فرۆشتنیانی لە بازاڕ تەنها لەبەر ئەوەی داوای چەند میگەلە مەڕێکی لیکردن وپێیان نەدان ، لە ڕاستیدا سەرکەوتن وجەنگاوەر لە میژوودا زیاتر تۆمارکراوە ،هەتا لە میژووی ئیسلامیش ، لەکاتیکا ئەسلی بانگەوازی ئیسلامی ئاشتیانەیە بەلام میژوویەکی پڕ لە غەزەوات و پەلامار هەیەو بوویتە جێی شانازی ، تەنانەت گەلێ جار شەڕکراوە تەنها بۆ باج ،داود

[166] السياسات والاثنيات فى العراق ص81

پاشا هێرشی کردە سەر حلەو ئابلوقەی دان تا70 هەزارقرانیان نەدا ئابلوقەی نەشکاند[167] ،جاریش وایە ئەوناوچانە تالان کراون،ئیتر لەژێر ناوی پیرۆز کراوە ،لەلای مێژوووناسانیش ئەو ڕووداوانە بە شانازیەوە تۆمارکراون ،سەرکردە مانای هێرش وپەلاماردان مانای غەزەوات ، بەو شێوەیە شەڕونائاشتی لەو پانتاییە جوگرافی ودینیەش ببوە ئەسل .

هەرلەوەشەوە دەبینین زۆربەی خوایە دەستکردەکان(کە زادەی عەقلی کۆمەلایەتیە) زیاتر خوای شەڕن کەمەك خوای ئاشتی وخۆشەویستی هەیە ،نمونەی خوای ئاشتی وزانست وحیکمەت: ئەسیناخوای ئەگریکەکان بوە ومینڤاش هەمان ڕۆلی بۆ ڕۆمانەکان بینیوە، ئیرۆسیش خوای ئاشتی وخۆشەویستی ڕۆمان بوە ، ئیسیس خوای خۆشەویستی میسریەکان بوە ،ئیلۆ خوایەکی خۆشەویستی ئەگاریەکانی کۆن بوە ،ئیناری خوایەکی میانڕەو لەسەرەخۆی بەشی کشت وکالی ژاپۆنیەکان بوو ،پلۆتۆس خوایەکی خۆشەویستی یۆنانی بوە بەلام خوای چینی دەولەمەندبوە ، توت خوای زانست وفلسفەو پزیشکی بوە بۆ میسریەکان ، تیمیس خوای یاساو دادگەری یۆنانیەکان بوە ، پۆت خوای زانین ودانایی وعەقلانی میسر بوە ، جحوتی خوای زانستی وعاقلایەتی میسریەکان بوە ،رادمنتۆس خوای دادگەریو عەقلانی بوە دایکیشی ناوی ئەوروپا بوە،شالیمۆ خواوەندی خێر ی ئۆگارینیەکان بوە ، فۆرسیتی خواوەندی ئاشتی ئەسکندینافیەکان بوە ،کیۆپید خوای ئاشتی ڕۆمان بوە ،میترا خواوەندی دادگەری ئاریەکان بوە[168].

نمونەی خوای شەڕو توندو تیژیەکانیش : ئەشتار خوای جەنگی ئاشوریەکان بوو، خوای میلەتی ئەنکا ناوی ئانتی بوو هەردەم تووڕەو شەڕاوی بوە، خوایەکی سۆمەریەکان بە ناوی ئانۆ لە شیوەی مانگای تووڕە ژمارەی پیرۆزیەکەی 60 بوە ئیتر بوە سیستەمی (60)ی وەك 60چرکەو خولەك و360پلەی گۆشەکان و..، ئۆدنیش خوای جەنگی ئەسکندینافیەکان بوە ،ئۆنیرۆس خوای جەنگی میسریەکانی کۆن بوە ، ئیرینیس خوای ئەگریکیەکان بوو بۆ تۆلەسەندنەوە ،ئیراناگی خوایەکی میلەتانی ژاپۆنی جەنگی بوە ،ئایسەر خوای جەنگی ئەسکنینافیەکان بوە ،ئەیسکۆلاب خوای چارەسەری نەخۆشی بوە

---

[167] سعد سلوم-السیاسات والاثنیات فی العراق(منذ الحکم العثمانی حتی الوقت الراهن) ص55

[168] قاموس الخرافات ةالاساطیر ص21،ص76،ص87، ص88،ص93 ص127،ص150،ص177 ص189،ص204

بەلام هەر توندو تووڕە بوە لەگەل ئەگریکەکان، ئینۆ خوای جەنگی ئەگریکەکان بوو،تاسنۆپ خوای جەنگی حیسیەکان بوە ، پور خوای جەنگی ئەسکندنافیەکان بوە ، مانگ گیران لە ئەنجامی شەڕی نێوان ئان وساندیت،سان پاریزگاری مانگە وهاوپەیمانە لەگەل شاماشی پاریزەرو خواوەندی رۆژ شەرشەکەیان لەسەر دەسەلاتە بەسەر هەمو جیهان ، بابا خواوەندیکی بابلیەکانی جەنگ بوە ،لاماشۆ ،مارس ،میرڤا مۆت،نینۆرتا ،یۆتیزلۆپۆ چیلی...ئەوانە هەموی خواوەندی شەڕو توندوتیژی بووینە[169] ، وادەردەکەوێ هەر ئەسلی مرۆڤ لە شەڕ هاتبێت ،وەك دەلێن لە رشتنی خوینی خواوەندی بابلیەکان (کینگۆ)هاتوە ،خوینی ئەو خواوەندە مرۆڤی لیدروست کرا (قاموس ص189) .

ئەوە بەلای چالاکی وئایدیۆلۆجیای مرۆڤی ،هەرچی ئەسلی ئاینیە جیایە ، ئەگەرچی هەندیك فتوای مەسیحی ویەهودی وئیسلامی دژ بەمافی مرۆڤ وئاشتی دەردەکەون بەلام جەوهەری ئاینەکان بەگشتی دژی چەوسانەوەو بەندایەتی و جەنگ ..بوە ، قەشەتۆما ئەکوینی بەو فراوانیە لەجیاتی ئاینەکان قسەی کردوە،رۆلی گرنگی بینیوە لە ئازادی وئاشتی ودیموکراسی ومەدەنیەت ، پاپا (یۆحنای بیستوسێهەم 1881-1963) جاڕنامەیەکی بەناوی (السلام علی الارض -4/11/1963) بلاوکردەوە[170]، لەو کاتیەوە زیاتر دام ودەزگای ئاینی مسیحی سالانە لەیادەکانیان باسی ئەو دروشمە دەکەن ،پیشوو تریش زانای مسیحی (سان پیار1658-1743) پرۆژەیەکی 3 بەرگی بەناوی (مشروع سلام الدائم) بلاوکردەوە،دوای رۆسۆ هەمان ناوەرۆکی لە سالی 1791 بلاوکردەوە .گرۆتیۆس (لەسەدەی 17) ەوە (قانون الحرب والسلام)ی بلاو کردەوە زیاتر رەهەندە دەولیەکانی بەخۆوە گرتبوو ،گرۆتیۆس کاریگەریەکی زۆریشی هەبوو بە ئارستەی داڕینینی ئاین لە پەیوەندیە دەولیەکان وەك پیادەکردنی ئاشتی . کۆن ترین کتیب لەبارە ئاشتی کەنزیك بێت لە تیگەیشتنەکانی ئاشتی سەردەم کتیبی (المدافع عن السلام)لە سالی 1324ز بلاوکرایتەوە لەلایەن (مارسیل دوبادوا)

---

[169] قـــــــاموس الخرافـــــــات ةالاســــــــــاطير ص11ص32 ،ص42 ، 56 وص57وص60 ،ص86 ،ص94 ص189،ص133،ص224،ص...

[170] بۆ زیاتر لەبارەی ئەو جاڕنامەیە بڕوانە: معجم المؤلفات السياسية ص1243

که تیایدا له بەرگی دوەم بەتوندی بەگژ فقهی مسیحی شەڕانی داچوویتەوە پشتی بەدەقەکانی مسیحی بەستوە بۆ ئاشتی ،ئەو یەکێکە لەوانەی ئاین وئاینپەروەرانی لیکجیاکردۆتەوە .

لەو سەردەمە زیاتر مسیحی ئاشتی بە مولکی میژوویی خۆیان دەزانن ،دەڵین هەتا لە خۆتوند کردنیشا بۆ ئاشتی بوە وەك لە نامەکەی قەدیس پۆلس بۆ خەلکی ئافسیس نوسیویەتی (وشدوا اقدامكم بالنشاط لاعلان بشارة السلام)[171].

ئەودەقانەی ئینجیل که داکۆکی لە ئاشتی دەکاتەوە وەك ئەسل گەلێ زۆرن بەلام لەهەمویان ڕوون تر کە بنەمای جۆرە ئاشتیەکی پەڕەگرە (ئەگەر شەقێکیان لەولا روومەتەدا لایەکەی تری بۆ وەرگێرە)(سمعتم انه قيل: عين بعين وسن بسن، أما أنا فأقول لكم: لا تقاوموا من يسيئ إليكم . من لطمك عن خدك الأيمن فحول له الآخر، ومن أراد أن يخاصمك ليأخذ ثوبك، فاترك له رداءك أيضاً))[172]،هەندێ دەقی تری ئینجیل لەبارەی ئەسلی ئاشتی هەڵدەبذێرین :

+ "هكَذَا نَحْنُ الْكَثِيرِينَ: جَسَدٌ وَاحِدٌ فِي الْمَسِيحِ، وَأَعْضَاءٌ بَعْضًا لِبَعْضٍ، كُلُّ وَاحِدٍ لِلآخَرِ" (رو 12: 5). (رومية 5: 1 وافسس 2: 14). ملوك 4: 29) (لوقا 10: 4).والمسيح "هو سلامنا" الذي "نقض حائط السياج المتوسط أي العداوة" بين اليهود والأمم (أف 2: 14) . فإنجيل المسيح هو رسالة سلام من الله للإنسان (لو 2: 14)،...لەدوا ئایەت دەردەکەوێ کە ئاشتی پەیامی خوایە بۆ مرۆڤایەتی .

لە تەوراتیش بەدەیان ئایەتی ئاشتی هەیە :فقال الرب لجدعون عندما ظهر له: "السلام لك" (قض 6: 23).... يرفع الرب وجهه عليك ويمنحك سلامًا" (عد 6: 26 ) بەهەمان مانا ئایەتەکانی ( مز 29: 11، إش 26: 12... ألخ). هەروەها بڕوانە: (تك 29: 6، 43: 23, 27، قض 18: 15، 19: 20)،

---

[171] توماس هوبز-اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص483

[172] كتاب المقدس– العهد الجديد، متى 5 (39 – 41)

مسیا(مسیح) وەك مهدی مونتەزری یەهودیە دێت سەرۆکی ئاشتیەو بیجەنگ وناکۆکی بۆ هەمو بەشەریەت دەیهینیتە دی .

لە هەردوولای ئیسلام ومەسیحی خوای ئاشتیە ،لە یەهودی سلام ناویکی خودا ئاشتیە چەمکی ئیبلیس(شەیتان)بەمانای بەمانای فتنەو ئاشوب ودژبە تەبایی وئاشتی هاتوە لە هەر 3 ئاین ولە ئاینەکانی تریش ، ئیبلیس لە قاموسی مسیحی بەمانای (روح الشریرە) یان مانای (دژە ئاشتی)لە یۆنانی بە (دیاپۆلۆس- διάβολος) هاتوە لە قبتی بە(دیاپۆلۆك)هاتوە[173] ،سەرەڕای ئەوانەش لەناو یەهودی واباوە کە ئەسلی دژواری لەو ئاینە زیاتر بێت لە ئاشتی ،هەرلە ئەفزەلیەتی ئەو میلەتەو بنەماکانی(شعب الله المختار) چەمکی ئومەمین، پرۆتۆکۆلەکان و زۆری تر ،لە پرۆتۆکۆلی ژ:1 هاتوە ماف دەسێنرێ بەتوندوتیژی وجەنگ نادرێ بە دیالۆگ وگفت وگۆ ..هەرلەو پرۆتۆکۆلە هەق وهیزی پێکوە بەستوە..بە مانایەك لەماناکا دەگۆترێ ئاینی مسیحی ئاشتی وئاینی یەهودی جەنگی وئاینی ئیسلامیش کۆکەرەوەی هەردوولا ، بەو تێگەیشتنە زۆر جار جۆرە دیزاینیکی دیالکتیکی بۆچەمکی ئاشتی لە نێوان هەر3 ئاینی سەرەکی(یەهودی ومسیحی وئیسلام)دەکرێت ودەگۆترێ تەورات شەڕانی وئینجیل ئاشتی وقورئان لەنێوان هەردوولا،دەلێن ئیتر ئەوەش سەرەنجامیکی لۆجیکی یاسای دیالکتیکی (سیکوچکەی هیگلی)یە ، لەسەر ئەو بنچینەیە وەرگێڕی کتێبی (سبینوزا) (حسن حنفی)، –رسالة فی اللاهوت والسیاسة - ئەو (ثالوثة)ی هیگلی وادارشتوە بۆ پەیوەندی دیالکتیکیانەی نێوان هەر 3 ئاین و دەلێ ::ئاینی یەهودی تایبەت Theses، ئاینی مسیحی دژی unti Theses کە ئیسلامیش هات ئەوا syn Theses [174]، وانیە ئەسلی هەمو ئاینەئاسمانیەکان ئاشتیە ، لە هەر3 ئاینەکان تا ئیستاش لەکاتی بەیەك گەیشتنی مرۆڤەکان بە (السلام –ئاشتی )دەست پێدەکا[175]

---

[173] قاموس الكتاب المقدس - دائرة المعارف الكتابية المسيحية –المادة:ابليس

[174] سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسة، ترجمة:د حسن حنفی، دارالطباعة-بیروت، ط1 ص100

[175] لەبارەی سەلاو کردن لە ئاینەکا بڕوانە : قاموس الكتاب المقدس - دائرة المعارف الكتابية المسيحية-المادة: السلام

، **علی عزت بیکۆڤیجیش له (الإسلام بين الشرق والغرب) ڕایەکی وای هەیە بەلام بەو ئاڕستەیە نیە ،بەلکو باس له واقعی ئەو ئاینانە وادەکات نەك ناوەڕۆکەکەی ،ئەو دەلێ ئاینی یەهودی توند بوە سۆشیالیستی لیبەرهەم هاتوە ،ئاینی مسیحیش نەرم دیموکراسی لیبەرهەم هاتوە ،ئاینی ئیسلامیش هەردوولا ..**

**له خویندنەوەی ئینجیل** (لا تقاوموا من يسيئ إليكم . من لطمك عن خدك الأيمن فحول له الآخر) ئەوە گوزارش لەگەل ڕسکان ودەستوری سروشتەکانی مرۆڤ وکۆمەلگە ناکات ،ئەو موتلەقیە خۆبەدەستەوە دانە ،ئاشتی ڕاستەقینە **مانای رەتکردنەوەی شەڕو جەنگ نیە بە موتلەقی** ، له ڕاستیدا هەمو جەنگ وشەڕێکیش نەرێنی نیە ،جەنگی بەرگری و رزگاری و دادگەری و و زۆر جۆرە جەنگی تر هەیە بە (جەنگی ڕەوا) ناوزەد دەکریت[176] .

<u>ڕایە جیایەکان:</u> ئاشتی یەکێکە له ناوەکانی خوای گەورە بۆیەش هەمو ئاینەکان ناویان (ئیسلام)ە بەمانای ئاشتی ، بەو مانایەی پێکەوە ژیانی کۆمەڵەی ئادەمیزاد بە پەیوەندیەکی هاوسەنگی و چارەسەرکردنی کێشەکانی له ڕێ ی دادگەری ترین یاسا کە (پەیامە)،بەو شێوەیە هەموو ئارامی و ئاسایشێك مانای (ئاشتی)ناگەیەنێ, جاری وایە ئەو بێ دەنگی و ئارامی له ئەنجامی زالّی لایەنێکی بەهێز بەسەر لایەنێکی بێ هێزە هەروەك له مێژوو لەاقعی ئێستاش پڕە له **نموونەی** وەك (غاندی)ی کە بنەماکانی ئاشتی ودادگەری کردۆتە ئەو بنچینەیە .

ئاشتی ئەو چەمکە ئەخلاقیە یە کە له بنچینەدا ئادمیزادوو دڕندەی پێ لێك جیادەکرێتەوە, پەیوەندی یەکەم مانای جەنگ کەچی ئەوەی دوەم ئاشتی, ئیتر هاریکاری و بەزەیی و ئەمەکی و راستگۆیی و دادگەری و هەمووی رەگەزی ئاشتین, ئاشتی چ له ئاستی تاکەکان چ بەکۆمەلّ چ لە جیاتی تەنیا بەو مەبادیئانە دێتە دی کە پەیوەندی و هەلّسوکەوتەکان بە دادگەریانە بێت، ئەوەش تەنیا بە کۆمەڵە یاسایەکی دادگەری و رەفتاری ئادەمیزادەکان لەگەلّ یەکتری لەئایندا لەم سیستەمە هەیە پێی دەلّێن (ئیحسان)،ئەوەش ئەو جۆرە پەیوەندیەیە لەگەلّ خەلّکی تر کە لە بەشێك

---

[176] له مەوسوعەی جودی بەشی یەکەم بڕوانە چەمکی (جەنگی ڕەوا) .

لەمافەكانی خۆشت بەجیٚ بێڵی بۆ بەرامبەرت, بۆیە ئەو چەمكانە لەگەڵ چەمكی برایەتی( چۆن ویستن بۆخۆت ئاواش بۆ خەڵكی تر)... بنەماكانی ئاشتین ،بەڵام نابیٚ لە یاد بكرێت دەروونی ئادەمیزاد (هەروەك لە چاكسازی باسكرا) یەكسان نین .

لەكاتێكا بەشێك لە مرۆڤەكان پێیان وایە ئەوەندە ئاشتی بە دیفاع لە خۆشت مەكە تەنها بە ئاشتی نەبیت پێیان دەووترێت (اللامقاوم) ،كە لەبنەچەدا لەو ئایەتەی ئینجیل هاتوە : .. **لاَ تُقَاوِمُوا الشَّرَّ، بَلْ مَنْ لَطَمَكَ عَلَى خَدِّكَ الأَيْمَنِ فَحَوِّلْ لَهُ الآخَرَ أَيْضًا**[177]، ماركسیەكان ناویان لە (اللامقاوم) ناوە (پاسیزم - pacifisme) ، ئەوانەن لە هەموو كات داوای دیالۆگ و دانوستان دەكەن هەتا ئەگەر وولاتیش داگیر كردنی هەر بەگفتووگۆ و ئاشتی، پاسفیزمیش نەهەموو كات راستە نەهەموو كات هەڵەی ، ئەوانەش بریتین لە بەشیك لەسۆشیال دیموكرات ومسیحی وئیخوان وجاروایە غاندیەكانیش دەگرێتەوە ئەوانە هەمو جۆرە جەنگێك ڕەتدەكەنەوە ،هەرچی مدرسەی ماركسیزمیش هەموو جۆرە(ئاشتی)یەكی لە ژێركۆمەڵگەیەكی چینایەتی ڕەت كردۆتەوە و بە (بەنج كردنی) لەقەلەم داوە، ئاشتی لە نیوان سەرمایەداری برۆلیتاریانیە،ئیتر هەردەم لەگەل گۆرین و جۆش و خرۆشاندن و و نەوەستانن , ئەنجلس كتیبیكی هەیە بەناوی (دور العنف فی التاریخ)، ماركس ئامۆژگاریەكی بە ناوبانگی هەیە بۆ شیوعیەكان و دەڵیٚ(ئێوە ئیسلاحی وئاشتیخوازمەبن توندو و شۆڕشگێڕ بن)،لینین دەلێت بۆ شۆڕشی پرۆلیتاریا پیویستمان بەوەیە دەزگای دەولەت تیكبشكێنین بەتوندوتیژی[178] ، ڕوون تر لەوەش لە كتێبی (بم نبدأ) دەڵیٚ: (نحن مبدئیا لم ننكر الارهاب یوما ولیس في وسعنا أن ننكره. فهو عمل من العمال العسكریة یمكنه أن یكون صالحا تماما وحتی ضروریا في لحظة معینة من القتال)[179]، لە كۆتاییدا ئەو بنەمایەی باكۆنین لەو مدرسە خەملی كە دەڵێت (خێر لەوەیە: تێك و پێك شكاندنی چی واقعیە)[180]،ئەوەش لەسەر بنچینەیەكی ڕەسەنی ماركسی و یاسای دیالێكتیەكان هاتووە، كە پەیڕەوانێكی زۆری (باكۆنین) هەبووە لە ئەوروپا لە

---

[177] إنجیل متی 5: 39 .

[178] اسس اللینینیه ص66.

[179] لینین –بم نبدأ -كتب في أیار (مایو) 1901 صدر في أیار 1901 في جریدة «الیسكرا»، العدد 4.

[180] مبادی الثورة- باكۆنین .

شێوەی ڕێکخراو بە ناوی: (ارادة الشعب)، (إشتراكيون الثوريون)، (إنتقام)، (المرعبون)، (ديناميتيه)، (إتحاد باكونين إيطاليا)، (لجنة الثورة)...ڕێکخراوی دژ بە ئاشتی بووینە ، تا ئەو دواییەش شان بەشانی (ئۆرۆ شیوعیة)و (سۆشیال دیموکاسی)- (الوية الحمراء إيطاليا)، (خلايا المسلحة لاتحاد لشعبی الفرنسا)و ڕێکخراوی (بادرمانیهۆف) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هەبووە- کە دامەزرێنەرەکانی: (ئەندریاس بادر و ئۆلریك فاینهۆف) چەپیەکی برجوازیش بوون، زۆر ڕەوشەنبیریش بوون چاکیش لە مارکسیەت گەیشتبوون ،ئەوانە (ئەنارکی -فوضوی)هەژماردەکری لە مارکس زیاتر دژی بوونی دەولەت ومولکیەت و(تەنانەت دژی سیستەمی دیموکراسیش بوون) ،دژی ئاینیش بوو،هەریەکە لەکرۆبۆتکین و برۆدۆن وفۆرۆپییان وابوو(ئەمریکی ئازادی رەها بۆ هەر تاکیك دادگەری دروست دەبیت)[181]، بەو شێوەیە لایەنی واقعیەکەی مارکسی لە نەزەریەکەی چاتر نیە، مێژووی 70 ساڵەی شیوعیەت سەرباری جەنگ و کوشتار و تۆقاندنی جیهان، لەناوەخۆش لەگەل معرەزەو نەیارو هەتا لەگەل هاوڕێیانی خۆشیان بە ئاشتیانە نەبوە، بەڵکو تیرۆر و تۆقاندن بوە .

بە پێی مارکسیەت ئاشتیش دەردە نەك چارە، ئیتر کەلتوری مارکسیەت پڕە لە مەبادئی شۆرشگێری, ئەگەر چی لەو دواییەی هەندێ گۆڕانکاری بەسەر واقعی مارکسیەت هێنرابوو بە ناوی (تعايش السلمی) ، ئەنجومەنیکی ئاشتیشیان هەبوو بەناوی (مجلس السلم العالمی) لە مانگی نۆڤمبری 1950 دروست بوە [182] ، هەندێك لە ئۆرۆشیوعی و سوشیال دیموکراسەکان هاتنە سەر ئەو ڕایەی ئاشتی هەبێت بەڵام بەدوو ڕووی خیانەت ناوبران لەلایەن شیوعیەکانی تر.

بەشیك لە توندڕەوی ئاینیش ئەو جۆرە ڕایەی بە شیوازی خۆی هەیە واتیگەیشتوە نابێ ئاشتی لە نیوان ئاینی ونائاینی هەبیت ، هەردەم لەجهاد بن ،لیرە جهاد بە مانای جەنگ،ئەوانەزیاتر بە کەلتوری شەڕاوی کۆن کاریگەرن ،ئەو کەلتورەی عربی کۆن (ايام العرب)وئاشتی ئیسلام زۆر بە خراپی تیکەلی یەکتر بوە ،ئەو تیکەلیە کاریگەریەکی خراتری کردۆتە سەرمیژووی ئیسلامی بە

---

[181] القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3 ص177 ، ص890 .

[182] القاموس السياسي – بونو ماريوف ترجمة واعداد -- عبد الرزاق الصافي ص210 .

جۆریك ناچاریه كه میژووی موسولمانان و ئیسلام لیك جیاكه‌یته‌وه ، به‌تایبه‌تی له‌سه‌رده‌می ئیستا له گوتارو هونه‌رو سینه‌ما وا ئه‌و میژوه پیشان ده‌دریٚ كه ته‌نها خوین رشتنه‌و ریكخستنی ژیان وشارستانی ومه‌ده‌نی تیدانه‌بوه ،به‌كورتی لایه‌نی ئاشتی زۆر به لاوازی پیشان ده‌دریٚ ، ئه‌گه‌ر به گویره‌ی دابه‌شی ئه‌هلی قه‌له‌م وئه‌هلی سه‌یف(شمشیر) بیت دیسان ئه‌هلی سه‌یف زۆر زالبوه‌و ئه‌و گوزارشته پشت راست ده‌كاته‌وه ، ئه‌گه‌ر ئه‌سلی ئاینه‌كان ئاشتی بووبێت(وه‌ك له‌سه‌روو باس كرا) ئه‌وا له میژووی ئاینیش دوو به‌ره هه‌بوه به‌ره‌ی ئه‌هلی سه‌یف وئه‌هلی قه‌له‌م ،له‌و سه‌رده‌مه‌ش(ئه‌هلی سه‌یف وئه‌هلی قه‌له‌م) له سیسته‌مه‌(وه‌زعیه‌كان)به ئاشكرا به‌دی ده‌كرێت به زاراوه‌یه‌كی تر گوزارش ده‌كریٚ، پێیان ده‌ووتریٚ (حمائم وصقور) به جۆرێك (حمائم)ئه‌هلی ئاشتین و(صقور)ئه‌هلی جه‌نگ و (توندره‌و).

له‌و سه‌رده‌مه هه‌ول دراوه خۆ دزینه‌وه‌یه‌ك له تاوانی جه‌نگ وویرانی بدرێته پال ئاین ، پاكانه بۆ سیسته‌می لیبرال دیموكراسی بكرێت ، ئۆنیل رۆست پێی وایه جه‌نگه گه‌وره‌كان هه‌رگیز له نێوان سیسته‌مه لیبرال دیموكراسیه‌كان نه‌كراوه ،ئه‌و بۆچونه‌ی دریژ كردۆته‌وه بۆ میژووش ، پێشی وایه 3 هۆكار به‌ره‌به‌ره ئاشتی ده‌هینێته‌دی (دیموكراسی و بازرگانی هاوبه‌ش و پیكه‌وه بوون له ریكخراوه یه‌كی ئیقلیمی یان ده‌ولی) ، له شوینیكی تر ده‌لیت ته‌نها له‌لیبرالدیموكراسی ئاشتی به‌رقه‌رار ده‌بێت و مافی مرۆڤی تیا ده‌پاریزری[183]، ئه‌گه‌رچی ئیستا ئه‌وان هه‌لگری ئاشتی جیهانن به‌لام زۆربه‌ی جه‌نگه‌كانیش له ناوچه‌ی لیبرال دیموكراسی بوه ،جه‌نكه‌كانی 500 ساله‌و 100 ساله‌و 30ساله‌ی ..ئه‌ورووپی ، هه‌ردوو جه‌نگی جیهانیو جه‌نگه ڕه‌گه‌ز په‌رستی و نه‌ژادی وئاپارتاید..، له‌سالی 1864 كاتی ده‌سته‌یه‌كی ئاشتی چوون بۆ ئاگربه‌ست (جیفرسۆن- كه به داكانه‌ی دامه‌زرینه‌رانی ئه‌مریكا هه‌ژمار ده‌كریت )وای وه‌لام دابووونه‌وه : ده‌بیٚ جه‌نگ به‌رده‌وام بیت تا یه‌ك كه‌س له‌و شاخه مابیت و ده‌بی سه‌ربه‌خۆیی به‌ده‌ست بهینین[184] ، جاریش وایه جه‌نگ ده‌كریٚ به پاساوی ئاشتی ، ڕیسایه‌كیشی هه‌یه (فلسفه‌ی الحرب من اجل السلام ..القوه مقابل القوه) ،له‌و باره‌یه‌وه (دیگۆل)

[183] قانون اشعوب : ص70 وص87 ص129 .

[184] david Donald - simon and Schuster 1995 p523

دەلێ دەرگای ئاشتی بە کلیلی هیز دەکریتەوە، هەروەك ئەو ڕێسایە لەسالی 1868وەلەلایەن سیرنۆ سیکۆفیج سەلماندوویە (هێز تەنها بە هێز دەوەستێنرێ)،رۆزفلتی ئەمریکی سیاسەتی (فامچی گەورەی– Big stick policy) لە پیناو ئاشتی بەرزکردەوە ، دەیووت ئەگەر قامچیت بەدەستەوە بوو بە هیواشی وئاشتیانەش قسەبکەی خواستەکەت دێتە دی، ڕای تریش وەك (فریدریك هاکر)دەلێت: (أفضل لنا أن نرهب الاخرين من ان يرهبنا الاخرون)،یان دەلێن(گورگ بە تاگورگ نەتخوات)،تەنانەت هتلەر لەژێر پەردەی رینمایی مسیح جەنگەکانی دەکرد ،لە ووتاریکی جەماوەری سالی 1926 لە میونیخ بەبۆنەی سەری سال دەلیت : مەلین مسیح ئاشتیخوازبوە وەك کنیسە وای دەردەخا بەلکو گەورەترین شەڕکەر بوە ،من یەکیك دەبم لەوانەی ئەو ڕینماییەی مسیحی جیبەجی دەکەم ،سۆشیالیستی نیشتمانی(نازی)هاتوە بۆ پیادەکردنی مسیحیەت[185]، ئیتر کار گەیشتە جەنگی جیهانی دوەم وگەورەترین پیشیلکاری ئاشتی لە میژووی جیهان ، تیۆریکی تری ماترینخ هەیە پێی وایە ئاشتی ئەوکاتە دێتەدی کەهاوسەنگی هێز هەبیت نەك لاسەنگ .

جاران وەك نەریتی دەولی شرعیەت بە جەنگ درابوو بۆ یەکلا کردنەوەی کیشەکان ، تیایدا سەرکەوتن دەبوە دادگا، تالە سالی 1924 عەسبەتولئومەم (پرۆتۆکۆلی جنیف) ی گریدا بۆ ئاشتی وتیایدا جەنگ بەتاوان ناوزەد کردو بەدیلی جەنگی دارشت دادگای نیودەولەتی[186] . هەرچی نەتەوە یەکگرتوەکان لە پیناو ئاشتی دروست بووینە تەنانەت بەندی 7 ..بۆ دژی (دژە ئاشتیانە)، لەکۆتاییدا ماوە شتێك بلێین ئەگەر چی میژوو ئاوا پڕلەشەڕوشۆڕ هاتوە کەچی زانیویشیانە خودا دژی جەنگ ودەست دریژیکارە بەلکو لەگەل ئاشتی وئارامیە بەبەلگەی ئەوەی ئەگەر کارەساتەکی سروشتی بهاتبوایە یان مانگ گیران یان رۆژ گیران هەمو جەنگەك دەبوایە بوەستێ وئاشتی بکرابایە وەك ئەو جەنگە 5سالیەی نێوان ئیمپراتۆریەتی میدیاو دەولەتی لیدی لە 590 پ ز هەلگیرسا لە 585 پ ز وەستا بەهۆی رۆژگیران..واتە واتیگەیشتوون رۆژگیران گوزارشە لە تووڕەیی خودا لەو جەنگ وئاشوبە .

---

[185] Friedioner – nazy germany and the gews p102

[186] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ..ص77

<u>ئاشتی لەداهاتوو</u> : بەشیکی زۆر لە زاناو فەیلەسوفان پێیان وایە سروشتی مرۆڤ سەلبی ونەگریسە چونکە لە ناخیدا لایەنی (شەڕ)ی زاڵە بەسەر لایەنی خێری، ،لەسەر ئەو بنچینە هەر یەکە لە هۆبز, نەتچە, فروید, میگافیلی,مارکس ..پێیان وایە ئادەمیزاد بە سروشتی خۆی شەرانگێزو دڕندەیە ، (ئەبو عەلای معەری) یش لە مرۆڤ بێئومێدەوپێی وایە ناخی مرۆڤ شەڕانگێزیە،وەك لەو شیعرانەشی دەردەکەوێ:

ان مازت الناس اخلاق فانهم عند سوء الطبع يقاس بها اسوأ... لة شوينيكى تر : ومابى طرق للمسير ولاالسرى لآنى ضرير لاتضيء لى الطرق

بەو شێوەیە ئەوانە زیاتر لە چارەنوسی مرۆڤایەتی بێئومیدن ئاشتی گشتی بێتە دی ،لە ڕاستیدا هەمو مرۆڤ شەڕانگێز نیە، ڕەنگە بەشە هەرە زۆرەکە مرۆڤ شەڕانگێز بێت، بۆیەش بەشی زۆری مێژوو بریتیە لە جەنگ و زۆرداری, وەك(ڤۆلتێر)گوزارشی لەو بیئومیدیە بە ووتەکەی ( مێژوو بریتیە لە ئەرشیفی تاوانەکانی مرۆڤ)[187]کردوە ،کیشەکە لەوەیە مرۆڤە شڕانگیزەکان هەمو دەم ئەو سیفاتەیان لیدەرناکەوێ تا دەسەلاتیان هەبێ ئینجا دەردەکەوێ ، هەتا بۆی بەجێبێڵی ئەو سروشتە فیرعەونیەی زیاد دەکات, بۆیە لە ئاینی ڕەسەن ئاشتی ئاشتەبەتاڵی نیە (یان وەك دروشمی عەرەبی ئەو سەردەمە بەرامبەر ئیسرائیل( سلام الاستسلام)ی تێکەل کردوە ،چونکە خۆ بە دەستەوە دان و تەنازول و گفتووگۆو لۆژیك لەگەڵ شەرانگێز هەمو دەم سودی نیە،لە کوردی ووتراوە(مست لە درێشە دەگەرێتەوە), هەروەك بەهەموو تاریکایی گەردوون بریسکە ئاگرێکی زیان بەخشی پێ ناکووژێتەوە [188], بەهەمان شێوەش بەهەموو ئاشتی جیهان تاکە یەك نەفەری شەرانگێزی پێ ناپووکێتەوە ، بۆیە جاروایە ئاشتی ئاوەلناوێکی زیاتری دەوێ تامانا ڕاستەفینەکەی دەرکەوێ لە ئاشتی سەرشۆڕی و ئاشتی خۆبەدەستەوەدان جیا بکریتەوە،لیرە پەیوەندی ئاشتی بە جەنگی ڕەوا دەدۆزریتەوە ،واتە ئاشتی رەتکردنەوەی هەمو جەنگیك نیە جەنگی رەوا ئەو جۆرە ئاشتیە دەهینیت دی کە ئاشتی هاوسەنگە ، بۆیەش ئاشتی بێ ئامرازوو ئامادەیی جەنگ نایەتەدی, چونکە شەرانگێزی بەند نیە بە

---

[187] توينبى منهج التاريخ وفلسفة التاريخ ص7.

[188]لە ئەسڵدا ئەوە قسەی (ئۆرکا)یەکە دەڵێ (ان الظلام العالم كله عاجز عن اطفاء الشمعه) .

قۆناغێك یان بە چینێکی کۆمەڵ ... بەڵکو بەندێکە لە ناخی ئادەمیزاد ، بۆیەش دیگۆل ووتویەتی کلیلەکانی ئاشتی بە (هیز)دەکرێتەوە ، یەکێك لە شکستەکانی عەرەب بەرامبەر ئیسرائیل ئەوەیە ئاشتی تاکە رێگەو ویستی بنچینەییە ، لەبەرامبەردا ئیسرائیل ریزی ئەو ئاشتیەی لا نیەو کارەکە لاسەنگ دەبێت ئیسرائیل دەڵێ سوپایەکمان هەیە  چاکترین موفەسیری (تەوراتە), ئەو دەکشێتەوە ئیسرائیل دێتە پێش, هەر بۆیەش یەکەم جارە ئیسرائیل بەرامبەر عەرەب لە خوارووی لبنان دەرکرا لە لایەن حزب الله چونکە ئەو یاسایەی دووەمی بەکارهێنا (جیهاد)ئینجا ئەو ئاشتیەی ئێستا ی خوارووی لبنان هاتەدی نەك بریارەکەی (240-un)،ئەوەش لە مێژوو دا هەروا بووە ... لە وەزیری بەرگری یابانیان پرسی ئەگەر ئێوە چەکی ناوکییتان هەبووایە لە ئەمریکاتان دەداوە کەلە ناکازاکی دا ، لە وەڵامدا ووتی ئەگەر نەوەویمان هەبووایە هەر لە ئەسڵدا ئەمریکا نەدەوێرا لێمان بدات!  واتە هێز.... دوورە بەلاشت دەکاتەوە ، بەو شێوەیە هاوکیشەکەی (ئەهلی قەلەم وئەهلی سەیف ) هەردوولا پێویستە ،مادام شەڕانگیزی لە سروشتی زۆربەی مرۆڤەکان تەئسیلە ،مادام ئاشتی هەمودەم ولەگەل هەمو لایەك بە خۆشی ودیالۆگ نایەتەدی، زانایانی ئیسلامیش بە جۆرێك هەر وایان ووتوە ،ئیبن تەقتەقی دەڵێ (السیف یحفظ القلم فهو یجري معه مجري الحارس الخادم) ،بەلام ابن تەقتەقی باسی ئەوەی نەکردوە ئاخۆ چەندە قەلەمیش شمشیر دەپاریزی و ڕینمایی دەکا، یان بەدیویکی تر پرسیارەکە ، ئاخۆ ئاشتی و قەلەم لە خزمەتی شمشیرو جەنگە یان بە پیچەوانە؟ کامیان کامین بەرێوەدەباو کامیان ئامانجەو کامیان ئامرازە؟ (ابن طق طقی) لە (الفخری في اداب السلطانیة) وەلامێکی تری هەبوە و دەلێ واباوو بوو گوایە(ئەگەر سیاسەتی دەروونی تاك چاك بوو خێزانەکەش چا دەبێ، ئەگەر خێزانیش چا بوو دێیەکەش چا دەبی، تا شار و وڵاتەکەش بەو زنجیرەیە چا دەبێت وئاشتی وئارامی بەرقەرار دەبێت ، ئەو (احسانە)ی ئاین و ئەو ئامۆژگاریە پڕ رەوشتیەئاینی مەسیحی وبنەما ئاشتیەکانی تری زۆربەی ئاینیەکانی تر ،تادەگاتە ڕێنماییە مرۆڤایەتیەکەی ( حسن البنا)کە دەڵێ: ئێوە وەك درەخت بن ئەگەرگاشە بەردیکیان تێگرتن میوەیان بۆ بەردەنەوە،هەروەها ئەوەی مسیحیش(ئەگەر شەقێکیان لەولا روومەتەدا لایەکەی تری بۆ وەرگێرە) ،ئەوانە نەبووینە ڕێگری شەڕو هێنانەدی ئاشتی سەرانسەری، بەهەمان شێوە خۆبەدەستەوەدان و وپاسیفیزم و(اللامقاوم)ی سەردەمی کۆن ونوێ  قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملکوت الله) داوا دەکا بە چەوسانەوە

قایل بن و دەلیّ : (بۆیە خواكۆیلایاتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی كۆیلایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[190] ، ابن عبد ربە هەمان بۆچوون بەناوی ئاینی ئیسلام دووبارە دەكاتەوەو دەلیّ:اذاكانالحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)[191]، ئةوة لة بنضينةدا ابن مسعود ووتويةتى وةك لة(عيون الاخبار )هاتوة: إذا كان الإمام عادلاً فله الأجر وعليك الشكر، وإذا كان جائراً فعليه الوزر وعليك الصبر .. بەهەمان ئارِستە ئیمام تەحاوی دەلیت: ولا نرى الخروج على أئمتنا وولاة أمورنا ، وإن جاروا..) ، ئیمام ئیبن تەیمیەش دەلیّ: الصبر على جور الأئمة أصل من أصول أهل السُنة والجماعة [191]... زۆر بەكەمی پەیرِەو كردنی ئەو بنەمایانە بوویتە هۆی رِاگرتنی شەرِانگێزیك وتا ئاشتی بە ئاشتیانە بەسەر شەرِزال بێت ،قەلەم بەسەر شمشێر زال بێت ، هەموو ئەو مەبدەئە جوانانە رِاست و دروستە بۆ كۆمەلّ و مرۆڤە رەوشت بالاّكان چ هاوولاتی بێت چ دەسەلاتدار ، ئەوانە هەموو بۆ كۆمەلّگەیەك كە هەمووی پیاو چاك بن.... بۆیە وەك (رِۆسۆ)دەلّیّ ئەو چەند بەندەی مەسیحی ئەو كاتی پەیرەو دەكریّ كەهەموو كۆمەلّگە مەسیحی پیاو چاك بن كە نا بێت[192]، قورئانی پیرۆز چەند پاتی كردۆتەوە كە كەمایەتیەكی مرۆڤ وا رەوشت بەرزن زۆرایەتیەكەی دژی حەق و شەرانگێزو مەیلی زۆرداری و دەسەلاّتی خۆ زالّكردن و دژە ئاشتین(اكثركم للحق كارهين) كەواتە ئەو بنەمایانە جاروایە هاندەری شەرِن وئاشتیەكی سەرشۆرِی دێنێنە دی ، لایەنی داگیركراو وزولم لیكراو بەنج دەكا وەك ماركس وای ووت.

لە پرِۆتۆكۆلی ژ:1ی (بروتوكولات حكماو صهيون)هەمان بنەمای میكافیلی هاتوە ودەلیت (والحاكم المقيد بالاخلاق ليس بسياسي بارع، وهو لذلك غير راسخ على عرشه) ورِای تریش هەیە دەلێن : ئارامی وخۆشگوزەرانی میلەتان لە ئازادی نیە بەلكولە دەسەلاتداریكی توندە ، هینانەدی ئاشتی

---

[189] ماركسية قرن عشرين ص146.

[190] د محمد شحرور–الكتاب والقران ص101.

[191] مجموع الفتاوى ج28ص179 .

[192] جان جاك رؤسؤ- فى عقد الاجتماعي ص 208 .

وەك بەرپا كردنی جەنگ نیە ، یەكەمیان زەحمەت ودوەمیان ئاسانترە ، بۆیە ئەو نەستەقەی كورد كە لەبارەی تێكچوونی ئاشتی وبەرپابوونی ئاژاوە دەگۆترێ چەپلە بەدەستیك لێنادرێت وەك ئاماژە بەوەی هەردوو لاتاوانباربكرێت ، كەچی ڕاستیەكەی وانیە بۆ تیكدانی ئاشتی چەپلە بەدەستیك لیدەرێ(واتە بەلایەك ئاژاوە دروست دەبێت) بەلام بۆ هینانەدی ئاشتی هەردوو دەستی دەوێ ، بۆیە هەموو ئەو مەبادیئانەی سەروو نوقستانن ئەگەر مەبادئی تری نەبێت بەرامبەر شەرانگێز بۆ دابین كردنی ئاشتی, هەڵبەتە رۆژئاوا هیچ كات لەسەر ئەو مەبدەئەی مەسیحیەت نەڕۆیشتووە و خاوەنی نەك دوو بەڵكو چەندین جەنگی جیهانین و تائێستاش بەپێ ی عەقڵی هێز كاردەكەن نەك هێزی عەقڵ، ئیتر هەموو شارستانیەكان رۆژئاوا , رۆژهەلات تا جیهانی سێیەم, دەوڵەت, مدرەسەكان,.... هێز بەكاردەهێنن،ئیتر ئەو زاراوانەی دیالۆك, ئاشتی, دانوستان, چارەسەری سیاسی, ... بەشی هەرەزۆری هەڵخە ڵەتینەری خاوەن هێزە بەرامبەربی ّهێز، ئەگینا ئەو مەبادیئانە رەسەنن مرۆڤایەتین ئەسڵی ئاینیشە ، ئیتر بەو شێوەیە دەگەرینەوە سەر مەبادیئەكانی ئیسلام كە بەشێكی گرنگی تری تەرخان كردووە بۆ بەرگری لە ئاشتی, بۆ هێنانەدی ئاشتی, بۆ دوژمنانی (..حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ), (قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ), ... خۆ ئامادەكردن و جەنگ و جیهادو تێكۆشانی كردۆتە بەشێك لە بڕوا, بەندكردنی تاوان باریش دەبێت وەك لەو كۆمەڵ ئایەتەكانی (ظالمي انفس)یان ئیتر ئەگەر هێزت نەبێ چۆن (اجنحوا الى السلم)بكەیت, بوونی هێزە زامنی ئاشتیە, بە پێچەوانەوە ئاشتی (لە جیهانی وەك ئێستا)ئەوكاتی زیاتر تێك دەچێت كاتێ لایەك هێزدارو لایەكەی تر كەم هێزە, لایەك تكنۆلۆجیایی بە هێزو لایەكەی تركەم ،تا ئەو ساتە زیاتر لە 7 جارە كورد یەكلایەنانە شەڕ ڕادەگری كەچی توركیا شەڕ ڕاناگری ، ئەو ریوایەتەی كە ووتراوە پیغمبەر(د خ)پیاوێكی پیادەی بێچەكی بینی ووتی ئەوە زۆر نزیكە بەلایە ، پیاوێكی چەكدارو گورج و گۆڵە شمشێر بە دەستی بینی ووتی ئەوە دوورە بەلایە، لەگەڵ سەردەمی ئێستاش یەك دەگرێتەوە چ لەسەر ئاستی پەیوەندیە نێو دەولەتیەكان چ لەسەر ئاستی پەیوەندی تاك بە تاك , ئێستاش ئەو میللەتانەی كەم هێزن ئاشتیان لێ دورترە.

کەواتە ئاشتی خاوەنی چەندین دەروازەیە نەك تەنیا یەك, هێنانەدی ئاشتی لە کۆمەڵگەو جیهانێکی دادگەر جیایە لەگەڵ کۆمەڵگەو جیهانێکی بێسەروبەرو نادادگەر،ئەگەر لەیەکەم بە (ئیحسان)بێتەدی ئەوە لە هی دووەم بە خەبات وبەرگری(جیهاد)دێتە دی، هەرچی تێکەڵ کردنێك ئەنجامی تاڵی دەبێت، هەر لە چوارچێوەی دادگەری وئاشتی و توندی ،دوانی یەکەم بە ڕاستەوانە پێکەوەبەستراون لەگەل سێیەمیش بەپیچەوانە پیکوەبەستراون ،بە دیویکی تر میانڕەوی و دادگەریش پێکەوە بەستراون ،هەرلەو سۆنگەوە بیریاری گەورە(عبدالوهاب المسیری) دەلێت لە پیناو دادگەری وئاشتی پێویست بەوە دەکات لە چوارچێوەی میانڕەوی هەندێ تەنازول لەمافەکانت بکەی .[193]، ئەوە دەبێت لە ژیانی سیاسی بەلام بە پێی تویژینەوەی ئەکادیمی ڕاست دەرناچێت ،دادگەری مانای تەنازول کردن نیە لە ماف ،هەمولایەك بەمافی خۆی دەگا ،تەنازول لە ماف بە خۆشی خۆت پێی دەووتریت (ئیحسان)نەك دادگەری ،خەریکە بلێین ئەو تەنازولە دەچێتە خانەی پەڕەگریەکی سووك،کەجار وایە هاتی شەڕخوازان دەدا شەڕت پێبفرۆشی.

لە کۆتایدا دەبێ ئەوە ڕوونکەینەوە کە ئاشتی وئارامی لیکجیان ،زۆرجار ئارامیەك هەیە مەرج نیە ئاشتی بێت ، وەك ئەو ئارامیە نسبیەی ئیستای جیهان هەلەیە بە ئاشتی وەسف بکرێت ، چونکە ئەگەر ئاشتی راستەقینە هەبیت هەرووڵاتەو ئەو هەمو سوپاوچەکەی بۆچیە،بودچەی تیچووی سالانەی هەرووڵاتیك بۆ بەرگری بەسە بۆتێرکردنی هەمو برسیەکانی سەرزەوی ، ڕای (معجم قرن 21) دەلی گەشەو ڕەوتی جیهان پیچەوانەی ئاشتی گوزەر دەکا،دەبتە جەنگ ،کەچی لە( ص112)دەلێ عەولەمە زیاتر ئاشتی دەهێنی  چونکە ترس لە تەکنیکی شەڕ زیاد دەکات ودەبتە مالوێرانی  پیشی وایە حکومەتی جیهانی ئاشتی دەبیت وعەولەمەش بەو ئاڕستەیە.

---

[193] د عبدالوهاب المسیری –فی الخطاب والمصطلح الصهیونی  ص232

(5)

# جهانگیری العولمة Globalization

ئەوانەش دەگریتەوە ( کۆسمۆپۆلۆتی ، ئیسپرانتۆ-زمانی جیهانی ،ئاشتی جیهانی – pax America..)

وەك زاراوە(جهانگیری)لەوەرگیرانی عەولەمەی عربی هاتوە ئەویش لە ئینگلیزیەکەی (Globalization) وەرگیراوە فرنسیەکەشی (Mondialisation)روسیەکەشی неоглобализм ...پیناسەو بۆچوونی جیای لیَ دروست بوە ، وەك لادانی سنورەکان لەبەردەم ئالوگۆری کالاو زانیاریەکان ،کورت کردنەوەی دووریەکان ،وەرچەرخانی بۆ گوندیك ، بەرپای یەك جیهان ویەك شارستانی... ،هەشە پێی وایە بریتیە لە زاڵکردنی ئەمریکا ،دیاردەیەکی نوێی ئیستعماریە، ئەنتۆنی ماجرۆ پێی وایەعەولومە بریتیە لە ململانیی هەردوو هێزە گەورەکە(مەبەستی سۆڤیەتی پیشوو وئەمریکابوو) ، رۆتشیلد دەلی عەولەمە واتە بەدەولی بوون..،پیتر مارکۆس ووتی تەنها شیوازیکی تری گەشەی سەرمایەداریە .. رۆبرت کۆهین دەلی لە نەوەتەکان عەولەمە سەری هەلدا ..ماری بۆر لیبرالیەو سەردەمی ئومەم کۆتایی هات نۆرەی مرۆڤایەتی وزەمینبازیە... یەکێکە لە چەمکە ناکۆکەکان بۆیە پیناسی زۆر وپەرتەوازەی هەیە ،هەندیکی لیهەلدەبژێرین :

+مهاتیرمحمد سەرۆك وەزیرانی مالیزیا: بریتیە لە گێرانەوەی ئیستعمار بەشیوەیەکی نوی بۆ وولاتانی جیهانی .

+وەزیری دەرەوەی ئیران: ویکهێنانەوەی جیهانە[194].

+ئنتۆنی گیدتز: ویکهینانەوەی زەمان وزەمین .

---

[194] د علی اکبر ولایتی – موسوعة الاسلام وایران ج3ص160 .

+ئیسلام کریمۆف: عەولەمە واتە ئەمرەکە (بە ئەمریکا کردنی جیهان) .

+ محمد عابد الجابری لە کتێبی(تیارات الفکر العربی المعاصر) : العولمة هي ايدولوجية تعبر بصورة مباشرة عن ارادة الهيمنة على العالم وامركتة.

+تۆم بالمیر(ئەمریکی): ئەو بەلای کال بوونەوەی پیرۆزی سنوری سیاسی بەرامبەر پیویستیەکانی بازاڕدەچیت ولەو ئەنجامە سیستەمیکی نوێی ئابووری وسیاسی دێتەکایەوە پێی دەووتریت عەولەمە.

+تۆماس فریدمان- لە کتێبی (العالم المسطح): ئەو گۆڕانە گەورەیەی لە ئەنجامی پیویستی کۆمپانیەکان بەیەکتری بۆ بازرگانیەکی فراوانتر بناغەی عەولەمە دروست دەکات.

+ جیێمس روزانۆ: إنّها العلاقة بين مستويات متعددة لتحليل الاقتصاد والسياسة والثقافة والأيدولوجيا، وتشمل: إعادة الإنتاج، وتداخل الصناعات عبر الحدود وانتشار أسواق التمويل، وتماثل السلع المستهلكة لمختلف الدول نتيجة الصراع بين المجموعات المهاجرة والمجموعات المقيمة.

+ کۆمەلیك ئەنسیکلۆبیدیای ئینگلیزی بەو شێوەیە گوزارش لە پیناسی عەولەمە دەکەن :

The integration of states through increasing contact communication and trade to create a holistic, single global system in which the process of change increasingly binds people together in a common fate.

+قاموس المصطلحات الدولية: ئەودۆخە جیهانی نوێیە کە زیاتر کەوتونە سەر ئالوگۆڕی پیویستیەکان لە کالاو پەیوەندی وهاریکاری وتیایدا دابڕان وقۆرخی هەریمایەتی نامینیت ، ئەوەندە جیاوازی لە نیوان ناوەکی ودەرەکی نامینیت[195] .

موسوعة العربية العالمية: هى عملية التداخل الثقافي بين أنحاء العالم المختلفة، وما ينتج عن ذلك من تأثير ثقافي وسياسي واقتصادي[196].

---

[195] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية –د احمد سعيفان ص244 .

[196] الموسوعة العربية العالمية : المادة: عولمة .

+ الموسوعه اليهوديه: پێی وایه جهانگیری بریتیه له وەرچەرخانی جیهان بۆ بازاریکی گەورە تیایدا مادە دەبیتە پەیوەندی یەکەم ودوا ئامانج[197] .

+الموسوعة العربية: أحد أشكال الهيمنة الغربية الجديدة، التي تعبر عن المركزية الأوربية في العصر الحديث[198].

+ موسوعه المعرفه: العولمة هي تلك العملية التي يتم فيها تحويل الظواهر المحلية أو الإقليمية إلى ظواهر عالمية.

+موسوعة السياسية : نظام عالمي جديد يقوم على العقل الالكتروني، والثورة المعلوماتية القائمة على المعلومات، والإبداع التقني غيرالمحدود دون اعتبار للأنظمة، والحضارات، والثقافات، والقيم،الحدود الجغرافية، والسياسية القائمة في العالم، .

+الموسوعة الميسرة: هەلگرتنی هەمو ئەو کۆت وبەندانەی سنورو هەریم وکیشوەر له پیش ئال وگۆڕی کالاو خزمەتگوزاری وبانك و..تا تەواوی سەرزەوی دەبێتە یەك بازاڕ.

+له شوینیکی تری هەمان ئەو مەوسوعەیە(الموسوعة الميسرة للمصطلحات)واهاتوه :العولمه ماهی الا رسمله العالم[199]

+معجم ويبه دەلێ هەر دیاردەیەك رەهەندی جیهانی وەرگریت بە ئینگلیزی پێی ووتراوە (گلۆبال)و بە فرنسیش (ماندیالیزەتیف-mandialisatiav) .

+ فەرهەنگی سیاسی: بریتیه له له پرۆسەی چڕ بوونەوەی کات وشوێن کە بۆتە هۆی ئەوەی خەلکی دنیاکەم وزۆر بەشێوەیەکی تاڕادەیەك ووشیارانە له ناو کۆمەلگای جیهان بتوینەوە[200] .

+المصطلحات السياسية الشائعة: وهي منسوبة إلى العالم أي الكون وهي شيء أو نظام جديد يراد به توحيد العالم في إطار جديد واحد،

---

[197] الموسوعه اليهود واليهوديه والصهيونيه ج1 ص24.

[198] الموسوعه العربيه ج13 ص623-

[199] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص2311 ،ص307.

[200] فەرهەنگی سیاسی(ئارش) ل73.

+مصطلحات سياسيةالشاملة: ظاهرةاستعماريه جديدة...مذهب سياسي واقتصادي واجتماعي وثقافي يهدف إلى إزالة الحدودبين دول العالم أمام نقل البضائع والأموال والمعلومات والأفكار والثقافات، بحيث لا يعترض هذا كله أية عوائق أو حدود.

+تيارات فكريه: بەمانای جیهانی بوون، دەرچوون لەکاروباری سادەی نەتەوەو ناوچەیەك بۆدەروازە جیهانیەکان بەهەمو مانایەکانیەوە*** .

+ معجم القرن21 : عەولەمە بریتیە لە گەورە بوونی ئالوگۆڕلە ژێر فشاری بازاڕ***.

+مارتن ولاتر ووتی پرۆسەیەکە لە سنورە جوگرافیەکان ئاودیو دەبیت ، محمدعابدجابری ناوی نا (پۆست ئیمپریالیزم)ـ

+بابە شنۆدەی سێیەم : عەولەمە بریتیە لە کردنەوەو شکاندنی بەربەستەکان -العولمة هي انفتاحنا على باقي بلاد العالم, وانفتاحها هي علينا, وكسر الحواجز الفاصلة...
+موسوعه لالاند الفلسفيه ج3ص1503 :( universalisation ) ی بە (عەولەمە) تەرجەمە کردوە، پیناسەکەشی بریتیە لە :گواستنەوە لە بچوك وتاکەوە بۆ گشتی و لەوەوە پیناسی عەولەمەیە بەلام دوای زیاتر بەلای شمولی چوە نەك عەولەمە .

+ معجم القرن21 ص146 عەولەمە بریتیە لە گەورە بوونی ئالوگۆڕلە ژێر فشاری بازاڕ.

لەگەل پیناسیکی یەکجار زۆری تر، رۆتشیلد دەلی عەولەمە واتە بەدەولی بوون ..پیتر مارکۆس ووتی تەنها شیوازیکی تری گەشەی سەرمایەداریە .. رۆبرت کۆهین دەلی لە نەوەتەکان عەولەمە سەری هەلدا ، ئەنتۆنی ماجرۆ ووتی عەولومە بریتیە لە ململانیی هەروو هیزە گەورەکە ..کەچی ململانییەکە نەماو عەولەمەش بەردەوامە، ماری بۆر لیبرالیەو نەك سەردەمی نەتەوەکان بەلکو ئومەمەکانیش کۆتایی هات نۆرەی مرۆڤایەتی وزەمینگەراییە...

---

[201] د عبدالسلام راجح – تيارات فكريه معاصره ص61.
[202] معجم القرن21 - ص146.

**سەربردەی:** لەدوای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لەگەڵ تەنینەوەو خێرابوونی پەیوەندی و کەناڵە ئاسمانیەکان باس و زاراوەی (عەولەمە) زۆر بەخەستی کەوتە جیهان ، بۆیە بەشێکی زۆر واتێگەیشتوون کەتەمەنی عەولەمە کۆتایی سەدەی بیستە ،لەوانە محمد عابد جابری 10 نیشانەی داناوە بۆ قۆناغی عولمە وناوی ناوە (دوای ئیمپریالیزمی –پۆست ئیمپریالیزم) واتە قۆناغی دوای ئیمپریالیزم کە دەکاتە دوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم[203]، هەروەها روتشیلد و روبەرت کوهین وهەندیکی تر پێیان وایە عەولەمە زادەی سەدەی نوێ یە و واتە تەمەنی 15- 20 ساڵێکە،تا ڕادەیەك (الموسوعە العالمیە) ڕای وایە لەنەوەتەکانی سەدەی بیستەم سەری هەلدا، ووردتر لەوانە خاوەنی کتیبی ( فخ العولمە) پێی وایە ڕێك لە سالی 1995ەوە هاتوە کاتێ گۆرباتچۆفی سەرۆکی یەکیتی سۆڤیەت داوای لە 500 سەرکردەی جیهانی سیاسی و ئابووری وزانستی کرد کۆببنەوە لە هۆتیل (فیۆرمینت لە سانفرانسیسکۆ) بۆ دیاری کردنی ڕێڕەوی ژیانی سەدەی 21 ، بەشیکی تر زیاتر لەگەڵ جاڕنامەکەی سیستەمی نوێی جیهانی جۆرج بۆش لە 1991 لێ تێکەڵ بووە،بەشێکی تر پێیان وایەلەگەل ڕیکەوتنی "جات"1947- 1948هاتووە*،هەرچی(لی کوان)سەرۆك وەزیرانی سەنگافوورایە دەلێ سەرهەلدانی دەیان وولاتی نوێ لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم وبەشداریان لە ڕووداوەکان بوە هۆی بەرجەستە بوونی جیهانگیری[204].

ئەوەی زیاتر ئەو تێگە یشتنە هەڵەیە پتەو دەکا ئەوەیە وەك زاراوە لە فەرهەنگ و نووسینەکۆنەکان نەهاتوون، هەتا لە فەرهەنگێکی چالاکی وەك ئۆکسفۆردی 1991یش ئەو زاراوە نەهاتووە، لە بارەی یەکەم بەکارهینانی ئەو زاراوەو تەمەنی چەند ڕایەکی جیا هەیە ، بە پیی کتیبی (ما العولمە) یەکەم

---

[203] محمدعابد الجابری - العرب والعولمة ص297-

*ئەو ریکەوتنە لەنیوان ولاتانی پیشەساز بوولە1947دەستی پێ کرد لە 1948 پەیرەو کرا، 7 خولی تری دانوستان کرا تا سالی 1994بۆ ئازادی بازرگانی جهانی 124 وولات مۆریان کرد،سەرجەم بەلگە نامەکان 22000وکیشەکەی 175 کیلۆیە –بروانەالموسوعە السیاسیە الاژاعیەص148 .

[204] لی کوان- من العالم الثالث الی الاول-قصة سنغافورة 1965-2000 ص19

جار(وليام جيمس) له كتيبى (عالم متعدد) پيش بينى كردبوو كه ڕێڕەوى جيهان بەرەو يەك جيهانيە له ياساو نەريت وژيان ..[205] ، بەشيكى تر پێيان وايە سەرەتاى عەولەمە لەگەل دۆزينەوەى خوارووى ئەفريقاو ئوستراليا‌و ئەمريكا دەست پيدەكات ، پيشيان وانيە قۆناغيكى حەتمى ميژوويى بێت ،هەرچى ئينسيكلۆبيديە فلسفيەكانە لەوانە(Stanford Encyclopedia of Philosophy) دەلێ سەرەتاى عەولەمە لەگەل پەيدا بوونى تلفۆن وسكەى شەمەندەفەر(يان سەرەتاكانى سەرمايەدارى ) جمكن،هەرچى فەرهەنگى سياسى(ئارشى فارسيە) پێى وايە ميژوويەكى چەند سەدسالەى هەيە ، دروست تر(الموسوعه العربيه )[206] پێيوايە لە سەدەى 15ەوە دەستى پێكردوە ، بەشێكى تربەشيكى تر پييان وايە بە نيودەولەتى بوون پيش عەولەمەيە يەكەم جار لەگەل بەكارهينانپێيان وايە ڕێك بەروارى 1492ى دۆزينەوەى كيشوەرى ئەمريكاميژووى سەرمايەداريەو ميژووى عەولەمەشە ، سيستەمى نويى جيهانى لە كۆنگرەى ڤيەناى 1815 لەلايەن ماترنيخى سەرۆك وەزيرانى نەمسا دەست پيدەكات ، دواى ئەو هەريەكە لە بسمارك لەكۆتايى سەدەى 19 وكليمنسۆر ى فرنسى لەسەرەتاى سەدەى 20 بەكاريان هێناوە بەتايبەتى لە كۆنگرەى ڤيرساى 1919 ، هەرچى هيرمان دييلى (بە پێچەوانەى ڕاى سەروو هەروەها ڕاى رۆتشلد)جياوازى كردوە لە نيوان بە دەولى بوون وبە جيهانى بوون ، ئەنتۆنى ماژرۆ چوار پرۆسەى وەك نيشانەكانى عەولەمە ديارى كردوە ( ململانێى بە هيزەكان –داهينانى گەورەى تكنۆلۆجى- بلاو بونەوەى ئەو بەرهەمى ئەو داهينانە - نويبونەوە ) ، جان كۆپ پێى وايە جەنگى سارد بۆچوونەكانى ماركسى تيكڕووخاندو بەرجەستەى تاك جيهانى سەرمايەدارى دا و عەولەمەى ليهاتەدى.

لەلايەكى تريش واباوە يەكەم كەس زاراوەى (گلوبال- عولمە)ى بەكارهينا كومەلناسى كەنەدى (ماك لوهان)بووكە جيهانى بەرەو (گونديك) وەسف كرد، بە پيى (الموسوعه الميسره) پيش (ماك لۆهان) مارشال عەولەمەو گلۆبالى بەكارهيناوە ،پيش تريش(قريه العالميه- global vilaladg بەكاهاتوە ، **لە زاراوەى** (لوردات القريه العالميه the lords ofglobal village )هەبوە،ناوى (مردوخ –ماكسويل

---

[205] حسن حنفى –مالعولمة ص49 .

[206] ئاگادارى : (الموسوعه العربيه العالميه) لەگەل (الموسوعه العربيه)ليكجيان يەكەميان سعوديه دوەميان سوريه .

—ستيفينز..) لەلایەن نوسەر (باجدیکان) واهاتوە لەڕووی راگەیاندنەوە[207]، پیش تریش کاوس بەکاری هیناوە نەیووتوە گوند بەلکو ووتویەتی دونیا وادەبێتە شاریکی بچووك، هەرچی (موسوعە العرفە)یە باس لە (تچارلز راسیل)ی ئەمریکی دەکا کە یەکەم سەرمایەدار بوە بینای عەولەمەی دارشت ودەشلێ لە هەشتاکانی سەدەی بیست لەلایەن زانایانی کۆمەلناسی باس لە عەولەمەکراوە ، نزیك لەوە فەرهەنگی سیاسی(ئارشی فارسی) دەلی: لەدەوروبەری سالی 1960 گۆڤاری ئیکۆمنیست لە 1959/4/4زاراوەو گلۆبالیزمی(عەولەمی) بەکارهێنا ،دەشلی قاموسی وبیپستر یەکەم فەرهەنگ بوە زاراوەی گلۆبالیزمی پیناس کردوە[208]، هەرچی ( Stanford Encyclopedia of Philosophy) پێی وایە کۆتایی هینان بە سیاسەتی کلاسیکی لە ئالوگۆڕی ئابووری وبازاڕی ئازادی نوێ وشۆرشی ئنتەرنیت و(تکامل العالمی) و فەرهەنگە تەغریبیەکانی ترعەولەمە هاتە کایەوە، بە پێی (الموسوعە العربیە) لەدوای (ماك لۆهان) زیاتر بریجنسکی راویژکاری ئەمریکا بەکاری هێناوچەمکەکەی بە خێرایی کردە جیهانی[209] ، ئەنتۆنی ماجرۆ پێی وایەعەولومە لە ململانیی یەکێتی سۆڤیەتی پیشوو وئەمریکاپەیدابوو ..کەچی ململانێیەکە نەماو عەولەمەش بەردەوامە ، ڕاستیەکەی ئەوەیە زاراوەی عەولەمە لەو ماوەیەی دوای نەوەتەکانی سەدەی بیست هاتووە وەك (توماس فریدمان ) دەلی(( لە دوای جەنگی سارد ناوێکی وانەبوو گوزارش لەو قوناغە بکا و ئیتر ئەو ناوە هاتە کایەوە))، ئەگینا ماهیەتەکەی کۆنە لە سەدەکانی 17- 18 بەڕێکەوتووە، لەدوای شۆڕشی پیشەسازی و دۆزینەوەی کیشوەرەکان و کارلێك کردنی ئادەمیزاد لەگەڵ یەکتر لەسەر ئەو زەویە، بۆیە دەبینین ئەو سەردەمی وەسفی جیهان بە شاریکی گەورە دەکرا (هەروەك کریستیان کاوس لە پیشەکی کتیبی ئەمیر وای وەسفی جیهان کردوە)[210] ، هەرچی ئیستایە جیهان بە گوند وەسف دەکرێ، ڕەنگە لەسەدەی داهاتوو جیهان بە مالێك وەسف بکرێ یان بە تاکێك .

---

[207] الموسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية ص329 ص363

[208] فەرهەنگی سیاسی– ل73

[209] الموسوعة العربية ج13 ص623

[210]نیقولای میکافیلی – الامیر –ص2-5

جیهانگیری تازە نیە وەك(رۆبرت كۆهین)وزۆرانێكی تردەیلێین لە نەوەتەكان عەولەمە سەری هەلدا ، ئەوەیە تەنها لەو سەدەیە چەمكیكی بۆ داتاشراوە ئەگینا تەمەنی چەندین سەدەیە ، لە ئینسیكلۆبیدیای گەورەی ( NCYCLOPEDIA OF WORLD HISTORY) بەشی سێەمی بە سەردیری (The First Global Age) دەلیٚ شەپۆلی یەكەمی جیهانگیری لە 1450ز دەست پێدەكات تا 1750ز ، هەیە لەوەش قوول تر دەبێتەوە دەیباتەوە بۆ سەدەی 12 لەگەل سەرهەلدانی سەرمایەداری ، ئیبیڤ رۆنوار لە كتیبەكەی(رجال الاعمال الایطالیون فی القرون الوسطی) دەلیٚ سەرمایەداری لەسەدەی 12 ڕا دەست پیدەكات و یەكەم جار لە ئیتالیا بناغەكانی دامەزراوە نەك لە بریتانیا وەك باوە [211]،لەویش بۆ كاریگەریەكانی كتیبەكانی (ئیبن روشد) ،یان (روشدیەی لاتینی)،هەندیكیش بۆ یەكەم هەنگاوەكانی شەپۆلی ئیستعماری دەگێرنەوە ،لەوەش بەشێكی زۆر دەیگیرِنەوە بۆ ئیسپانیاو پورتغال كە بوونە میراتگری ئەندەلوس، هەر ئەوانیش لە سەدەی پازدە ڕیگەوبانەكانی جیهانیان دۆزیەوەو بەكاریان هێنا ،(د علی اكبر ولایەتی)وولاتی پرتغال بە یەكەم پیشرِەوانی ئیستعمار هەژمار دەكا،دەشلیٚ یەكەم شەپۆلی ئیستعماری لە سالی1500 هاتنەكلكیتیا بەلام لەوە سەركەوتو نەبوون وهەمو مال وسامانیشیان لەسەر دانا ،دوای لە1603ز بەرەو كۆكین چوون وقەلایەكی گەورەشیان بۆ خۆ دروست كرد [212] ..

.بە پێی هەمو پێوەرەكان یەكەم جار لە زانستەوە عەولەمە دەستی پێكرد و هەموو بەشەریەت لێكی وەرگرت بیٚئەوەی ناسنامەیەكی ئاینی یان جوگرافی یان شارستانی و ڕەگەزی تیابیٚ، (موسوعە لالاند) زاراوەی عەولەمەی لە (كۆسمۆپۆلۆتیك)بەرجەستە كردوە ودەلیٚ ، (علم كون برهان علی وجوداللە) —برهان حدوپ العالم مقابل كون الساكن —مجستی )فیساگۆریەكان كۆسمۆلۆجیایان بەكاردەهینا وەك گەردوونیكی ریك وپیك (دژ بەعەبەسی) مانای سیستەم ورژیمی گەردوونی ، بەو شێوەیە عەولەمە لە بیروفلسفەو زانستەوە هاتوە ئینجا وەرچەرخاوە بۆ بەرجەستە بوونی لەسەر زەوی ، كەواتە بەگشتی ڕوانگەی عەولەمە تازە نیە ئەگەر بەو چەمكە راستەوخۆش نەهاتبیٚ ، لەرەهەندی هەمو ئاینەكان هەبوەو لە ئیسلامدا لەهەموان زیاتروتەنانەت لە ئاینی ئیسلامدا وولات بە هەمو

[211] جورج قرم–تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص149 .
[212] د علی اكبر ولایتی — موسوعە الاسلام والایران ص334 .

زەوی هەژمارکراوە کە مرۆڤەکانن ئەو زەویانەیان دابەش کردوەو نیشتمان وفەرهەنگ وسیستەمی جیاجیایان لێ دروست کردوە ،گوتاری ئاینیش ڕووی لە هەمو جیهانە لە هەمو بەشەریت ،بۆیەش دروشمی غاندی بوە برایەتی گشت مرۆڤایەتی ، دوای لە شیوعەت عەولەمیەکی چینایەتی لیهێنا کایەوە ، وەك لینین دەلیٚ جاران دروشمی (هەمو خەلك برانە) باو بوو وەرمان گێڕا بۆ هەمو کریکاران بران ،لەویشەوە بۆ (ئەی کریکارانی جیهان یەکگرن)[213]، دوای گەشەسەندنی تکنۆلۆجی زۆر فراوان وای کرد هەمو سەرزەوی پیویستی بەیەکتر بێت ،وای کرد ئەوەی لەبیرو فلسفەو زانست وسیاسەت بە نەزەری دەقی گرتبوو بەرەبەرە ببتە واقیع،ێ بەرەبەرە لەگەڵ گەشەکردنەکانی کۆمەڵگە و ئادەمیزاد و سیستەمەکانی زانستی و ئابووری و سیاسی و عەقڵی و شارستانی و کەلتووری.. لەگەڵ بازدانی ئامرازەکانی پەیوەندی و هات وچۆ عەولەمە زیاتر باڵی کێشا بەسەر جیهان ، ئیتر لەو سەردەمە کەمتر دیاردەی دەڤەری ماوە ئۆتۆماتیکانە بوویتە عەولەمی،هەروەك (ماری بورلی )دەلیت سەردەمی نەتەوەکان کوتایی هات و نۆرەی زەوی گەراییە (عولمە)یە، جا لەباری وادا دەبتە جۆرێك لە ململانێی ناسنامە، هەروەها قەرەباڵخی ڤاکتەرەکان و گواستنەوەی مرۆڤ لە چواردیواری کۆمەڵگە و سنورە بچووکەکەی بەناوی نیشتمان بۆ جیهان، بەو شێوەیە هەم جهان بۆی بچووك دەبێتەوە هەم زەمەنیش تەسك دەبێتەوە، ئالێرەدا بیردۆزەی پێناسی عەولەمە بەمانا بچووك بوونەوەی جیهان هاتیتە کایەوە و بە(جهان دێیەکی بچووك) وەسف دەکرێ...ئیتر گەلالەی عەولەمە چەکەرەی کردو گەیشتە ئەو ئاستەی ئیستا .

ڕایە جیاکان: بەشێك هەن ڕاستەوخۆ بە (عالمیەت)گوزارشی دەکەن، ئەوەش نزیکە لە فەرهەنگی حوکومەتی جیهانی و فەلسەفەی کۆسمۆپۆلیتی(هاوولاتی گەردونی )... بۆ ئەو مەبەستەش زامانهۆڤ( 1917-1859) زمانیکی جیهانی پیشنیار کرد بە ناوی (ئیسپرانتۆ) واتە زمانی جیهانی کە لە28 پیتی لاتینی و ئەوروپی دروستی کردبوو بۆ ئەوەی بە ئاسانی هەمو جیهان لەو زمانە هاوبەشە بگات ، یەکەم دژایەتی عەولەمی شێوە کۆسمۆپۆلۆتی بزوتنەوەی شیوعیەت بوون بەبەدیلیکی تری عەولەمە ،کە پێی دەوترا (بنەماکانی ئومەمیەت) ،بە ڕای فەرهەنگی سۆڤیەتی کۆسمۆپۆلیتی

[213] لینین –المختارات ج1 ص542 .

تیۆریکی برجوازیە دژ بە ناسنامەی گەلانە ، دەیەوی خەباتی گەلان لە بەها ئابووریەکانی سەرمایەداری جهانی بتوینیتەوە لە چوارچیوەی حکومەتیکی سەرمایەداری جیهانی ،پێشی وایە لە جیاتی ئایدیۆلۆژی کۆسمۆپۆلۆتی پیویستە ئایدیۆلۆژی ئومەمی جێی بگریتەوە[214]، بەو شێوەیە لەشیوعەت عەولەمیەکی چینایەتی لیهێنا کایەوە ، وەك لینین دەلێ جاران دروشمی (هەمو خەلك برانە) وەرمان گێرا بۆ هەمو کریکاران بران[215]،بە هەمان شێوە تەیاری ئیسلامیش ئەودوو جۆرە جیهانی بوونە رەت دەکاتەوەو جیهانیەتیك لەسەر بنچینەی ئاین پیشکەش دەکات ، لەوانەش زیاتر هەشە پێی وایە عەولەمە سەلبیەو لە داهێنانی رۆژئاوایەو بەزاراوەی وەك (أمركه) و(عولمە القهر) و (استعمار الجديد)... وەسفی کردوون, مهاتیرمحمد سەرۆك وەزیرانی مالیزیا: پێی وایە مەبەست لە زەق کردنەوەی عەولەمە گێڕانەوەی ئیستعمار بەشیوەیەکی نوی بۆ وولاتانی جیهانی سێیەم ،هەمان ووتە لە (الموسوعه العربيه العالميه)هاتوە و دەلێ زالبوونیکی تری ئیستعماریە لەرێی گەشەی شارستانی لە جیاتی داگیرکاری بەزەبری هێز ، بە هەمان ئاڕستە ئیسلام کریمۆفی سەرۆکی ئۆزباکستان پیی وایە عەولەمە مانای ئەمرەکەو [216]،لەو چوار چێوەیە محمد عابدجابری عەولەمەی بە ئایدۆلۆجیای زال بوون وئەمرەکە کردنی جیهان وەسف کردووە[217] ، دەشلێن بۆیەش لایەنگروو دژیشی هەیە(وەك لە برگەی داهاتوو باسی دەکەین)...., ئەوەی ئەو بۆچوونەی خەست کردۆتەوە ،هەندێ دروشمی ئەمریکی وەك (ئاشتی جیهانی – pax America) کە لەئەسلدا لە (پاکس رۆمانا)هاتوە بە مانای زالکردنی رۆم بەسەر جیهان[218] ، (رۆزفلت) سەرۆکی ئەمریکا لە دوای جەنگی جیهانی دووەم ووتی کاتی ئەوە هاتووە (بە ئەمریکاکردنی)جیهان بکەین، هەرچەندە ئەو پەیامەی رۆزفلت لە چوارچیوەی پیشڕەوایەتیە، زۆربەیان داوای پێشڕەوایەتی جیهانیان کردووە, لە سیستەمی نۆێ جیهانیش، کاتی خۆی بەریتانیاش لەبارەی سیستەمی ئینتیداب تیڕوانینی وا بوو

---

[214] بۆری ماریۆف– قاموس السياسي ص195 .

[215] لینین –المختارات ج1 ص542 .

[216] فخ العولمة ص 49.

[217] محمد عابد الجابرى- تيارات الفكر العربى المعاصرص209

[218] د عبدالوهاب المسيرى – فى الخطاب والمصطلح الصهيونى ص236

(كە بەبنەمای ملتۆن ناوزەد دەكرا) دەووترا نابىٚ بەريتانيا پەيامە مێژوويیەكەی خۆی لەبیر بكا كە نەخشەرێگە دروست كردنی دەولەت وشارستانیە بۆ میلەتان تا بە خۆشی بژین (لا تدع بريطانيا تنسى رسالتها في تعليم الأمم كيف تعيش)[219]بۆیة فۆرستەر دەلێ بیرۆكەی ئینتداب و بە قوتابی كردنی میلەتانی جیهانی سێیەم بۆ ئەمریكاو رۆژئاوا بۆسالانی 1787 دەگەرێتەوە[220]،میلەتانی عربیش ئەو ئینتدابەو پەیامەی بریتانیاو ئەمریكاو رۆژئاوایان قەبوول كردو ئەو دەولەتانەی رۆژهەلانی ناوەراست لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بووینە ، كەواتە پیشرەوی ئەمریكاو رۆژئاوا بەهۆی عەولەمەو كاریگەریەكانی نیە زۆر لەپیش ئەوەیە ، بەو مانایەی عەولەمە لەسەدەی 21 بیەوێ بە ئەمرەكە كردنی جیهان بكات وجۆریكی نوێی ئیستعمار دابهێنیت ، بەلكو میلەتانی عەرەب وبەشیكی موسولمان زیاتر لەسەدەیەكە خۆیان داوەتە دەست پیشرەوایەتی رۆژئاوا .

<u>لایەنی زالٚ بەسەر عەولەمە(هۆكارو ئامارژە)</u> : عەولەمە هەم قۆناغیكی حەتمی گەشەی كۆمەلگەیە هەم بەرجەستەیەكی ئاینیشە ،كەچی بەشێك لە ئاینپەروەراو ئەوانەی زیاد لە پێویست باوەریان بە نەزەریەی موئامەرە هەیە واتیگەیشتون كە عەولەمە پیلانە،كەچی خودی عەولەمە دەردەكە نیە ،دەرد لە لایەنی زال و پیشرەوایەتی و ..هۆكاری ترە، كە بوویتە مولكی رۆژئاواو لەوەش خراتر فاكتەری ئابووری كراوەتە بنچینەی عەولەمە نەك مرۆڤایەتی وپەیوەندیە ئەخلاقیەكان ، رایەك هەیە دەلێ ئەوانەی وایان كرد عەولەمە ببتە مولكی رۆژئاوا لەو دەمە هەریەكە بە جۆریك(فیختە-هایردەر-شلینگ –نیتچە- تۆماسمان) ئەوانە روانگەیەكی گەردوونیان بۆ رۆژئاوا دارشت كە ئەو ئەنجامەی لیهاتەدی[221] ، فەرهەنگی ئەلمانیاو فرنساو بریتانیا هەریەكە بەجۆریك زال بوون بەسەر جیهان ، بە جۆرێك یەكەم جارفەرهەنگی كۆسمۆپۆلۆتی فرنسا لە سەدەی 17 و18 وزال بوو،وپیشرەو بوونی بەسەر فەرهەنگەكانی تری جهانی ورگرت، لەمانای كۆسمۆپۆلۆتی چۆنیەتی زال بوونیشیان

---

[219] د علی وردی –لمحات اجتماعیه...ج5- ص56

[220] فورستر.-نشأه دوله العراقیه ج1ص10، و ص88

[221] تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص39

تێدەگەین ، قەرهەنگی سیاسی (لارشی فارسی)دەلی کۆسمۆپۆلیتی بەمانای هاوولاتی جیهانی گەردوونی ، دژی کەلتورو ناسنامەی دەڤەریە ،باوەڕی بەحکومەتی جیهانی وکەلتورو ناسنامەی جیهانیە[222] ، بەمانای کارلیکی سیاسیو فەرهەنگی ویاسایی دەستی پیکردلە ژێر پیویستیە ئابووریەکان ،لەوەش ڕوونە کەلەو دەکە تکنۆلۆجیاوبازاڕی ئەوروپا زۆر زال ترە ،بۆیە ئەو کۆسمۆپۆلۆتیەی بەرێکەوت دیارە رۆژئاوا سەردەخاو فاکتەری ئابووریش دەکاتە بنچینەی عەولەمە ، بەو شێوەیە فرنسا رۆلێکی گرنگ لە زالیەتی فەرهەنگ دەبینی ، ،سەدەی 19 نۆرە ئەلمانیاش دیت ،بەریتانیاش بەردەوام هەلمەتە سەربازیەکانی شان بەشان ئەو فەرهەنگانەی گواستۆتەوە بوویتە هۆی زال بوونی باقی فاکتەرەکانی وەك ئیبن خەلدوون لە (مقدمە) بە دریژی باسی کردوە ، تاڕادەیەك دەست گۆڕیەك لە پیشڕەوایەتی عەولەمەو سەرکردایەتی کردنەکەی بەدی دەکرێ لە نێوان ئەو وولاتانە،ئینجا لەدوای هەردوو جەنگی جیهانی بۆ ئەمریکاش ، واش ڕێکەوت لەگەل سەرهەلدانی زەبەلاحی ئەمریکا چەمکی عەولەمەش بەرەبەرە چەکەرەی کرد، ئیتر عەولەمەو ئەوروپا تەسك بوویەوە بۆ ئەمرەکە بوون .

ئەو ئاماژەو هۆکارانەی بوونە هۆی بلێن عەولەمەو ئەمرەکە دووڕووی یەك دراون، ئەوانەی دەلین عەولەمە مانای ئەمرەکەیە هۆکارو ئاماژەی زۆر هەیە بەلام هەندێکیان ڕاستەوخۆترو پیشچاوترە، لەو لیدوانانەی گەورە بەرپرسانی ئەمریکی پیشوەخت دێت ، زۆریك هەن واهەست دەکەن ئەوەی ئیستا لە عەولەمە دەگوزەرێ بریتیە لە 14 مادەکەی ویلسۆنی (**سەرۆکی ئەمریکا**)**سالی** 1918 بەتایبەتی مادەی (دوو و سێ)، لادانی بەربەست بۆ بازاری ئازاد هەر لەرۆژئاواهاتوە چونکە لەقازانجیەتی هەر لە پرۆژە چاکسازیەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دووبارە دەبێتەوە ، مارشالی(وەزیری حکومی ئەمریکی )لەدوای جەنگی جیهانی دوەم بەرنامەکەی(خطة مارشال) وابوو جهان بە ئەمریکا بکا ، (رۆزفلت)ی سەرۆکی ئەمریکا لە دوای جەنگی جیهانی دووەم جاڕی (بە

---

[222] قەرهەنگی سیاسی ل535

ئەمریکاکردنی جیهان)ی دا ،. بریجنسکی راویژکاری ئەمریکا بەردەوام دەیووت ئەمریکا دەتوانی ببیتە پیشرەوی جیهان [223].

وەك لەڕای زۆربەی نووسەرانی عەرەب و لە(موسوعە العربیە) توندتر  هاتوەودەلێ ئەو ڕایانەی ئەمریکاو رۆژئاوا دوای بەرجەستە کراو هەولدرا رۆژئاوا مەرکەزی بێت لەو عەولەمە ، جا هەولرابێت چ بە پرۆسەیەکی گەشەی میژووی وای لێهاتبێت ئیستا رۆژئاوا پیشڕەوو سەرمەشقی عەولەمەیە ،ئیتر هەمان ئەو دۆخە دروست دەکا کە ئیبن خەلدوون وەسفی نێوان فەرهەنگی زال وفەرهەنگی ژێرکەوتوو دەکات ، ئیبن خەلدون وتوویەتی: داب و نەریت و دەستووری سیاسی و فەرهەنگی و کەلتووری لای سەرکەوتوو دەبێتە جیهانی[224]، هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەم، دوای سەرکەوتنی سەرخانی ڕۆژئاوای کەلتورمەسیحی بەسەر خەلافەت، بەرەبەرە بەرواری زایینی جێی بە بەرواری (رۆمی) و (کۆچی) لەق کرد تا بوە جیهانی، ئینجا پێوانەکانی کێشان و پێوان و دووری و... هەمووی بووە مەتر و کیلۆ و لیتر و... ئنجا جل و بەرگیش لەگەڵ زۆر دیاردەی تری وەك یاسای نێودەوڵەتی، جارڕنامەکانی جیهانی، (کۆمەڵەی نەتەوەکان- عصبە الامم)..ئیستا بەرەو ئەوە دەڕۆین نەریت ویاساو فەرهەنگی (ئەو گوندەی عەولەمە)بەتەواوی رۆژئاوایی بێت ،کە بەشێك ناویان لێناوە کۆتای میژوو .

## قۆناغەکانی عەولەمە:

کەمیك کیشە هەیە لەبارەی ئاخۆ عەولەمە قۆناغیکی سروشتی گەشەی کۆمەلە یان دەستکردو بە هۆی نەخشەی سیاسی ئابووری هاتە کایەوە ؟ بە پیی( موسوعە المعرفە) و(مالعولمە) عەولەمە قۆناغیکی حەتمی نیە ، بۆیەش دەشێ ڕووبەڕووی ببیەوە ،زۆربەی ئەوانەی دژی تەواوی عەولەمەن ئەو ڕایەیان هەیە ،لەلایەکی تریش ئەوانەی باوەڕیان بە نەزەریەی موئامرە هەیە هەمان بۆچوونیان هەیە ، بەلام بەشی زۆری تر ڕای پیچەوانەی هەیە ، لەو مەوسوعەش هەمان ڕا هەیە ،تەقەلای یەکزمان و حکومەتی جیهانی ویەك کۆمەلگەو یەك ئاین ویەك ئابووری جیهانی کراوە ..، ئەگەر

---

[223]الموسوعة العربية ج13 ص623

[224]ابن الخلدون –مقدمة ، تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر-القاهرة ص192

پرۆسەی گەشەی زمانی عەولەمی باس بکەین وورد تر دەردەکەوێ کە سەرەنجامیکی حەتمیە نەك دەستکرد، پیشنیاری زمانی جیهانی وەك بیرۆکەی جیهانی وعەولەمەیەکەم جار رینیە دیکارت لە سەدەی 17 بیرۆکەی یەك زمانی جیهانی گەلالە کرد ،لە هەمان کات قەشە (جۆن کۆمینیۆس) لە بۆهیما ئەو بیرۆکەی راگەیاندو لەو کاتەوە تا ئیستا ئەو تەقەلایە بەردەوامەو نزیکەی 200زمان پیشنیارکراوە ،بۆ ئەوەی ببتە جیهانی هەندیکی سروشتی وهەندیکی پاکیج وهەندیکی تریش دروست کراو ، لەوانە زمانی فۆلاپۆك (بەمانای ئاخافتنی جیهانی) کەلە 1879 لەلایەن قەشەی ئەلمانی (جوهان مارتن شیلەر) داهێنرا ، ئینجا زمانی ئیدیۆمنیوترال ،زمانی ئینتەرگلوسیا ، ..لەهەموان بە هیز تر زمانی ئیسپرانتۆ.. لەهەرە دوای زمانی ئینگلیزی بەسەر هەمو زمانی جهانی زال بوو بە سروشتی خۆی .

کەواتە دیاری کردنی زمان وفەرهەنگ وباقی توخمەکانی تری عەولەمە بە بڕیارو نەخشەو پلان نایەت ،بەلکو قۆناغی گەشەی سروشتی دەیهێنی ،(د علی اکبر ولایتی-وەزیری دەرەوەی ئیران) 5 قۆناغی بۆ عەولەمە دیاری کردوە :1- لە نێوان(1400-1750)ز وەك سەرەتا 2- لە نیوان(1750- 1875)قۆناغی دەرپەرین وبینا 3- لە نیوان (1875-1925) جەنگە جیهانیەکان 4-لەنیوان(1925-1969) پەیدا بوونی عوسبەو دوایش نەتەوە یەکگرتوەکان 5-(1969-1992) قۆناغی نائارامی تێکەل بوون وتاك جەمسەری وگەشەی گەورە [225]، بەدیویکی تری ئایدیۆلۆجیا 3 قۆناغ دیاری کراوە لەبارەی سەرهەڵدانی عەولەمە و ڕەگ و ریشەی ئاینی و سروشتیەکانی، عەولەمی پەیام (ئیسلامی)، دووەم عەولەمی شیوعیەت (أممیە)، سێیەم عەولەمەی ئێستای سەرمایەداری، بەشیکیش بەو دابەشیە رازی نین ،دەلێن ئەو دابەشیە زۆر دروست و زانستی نیە، ئەوە کاریگەری هەردوو تیۆری (ململانێی شارستانی) هندگتۆن و (کۆتایی مێژوو)ی ڤۆکۆیاماو تێکڕای تیۆری پەرە سەندنی لەسەرە، مادام ناوی قۆناغ بهێنێ، خۆ بیکردبایە (3) جۆر ئەوە مانایەکی تری هەڵدەگرت، راستیەکەی ئەوەیە لە جەوهەردا هەردوو جۆر عەولەمەیە:

---

[225] د علی اکبر ولایتی وسوعە الاسلام وایران ج3ص166-167

**1- عەولەمەی ئاین یان بەگشتی عەولەمەی پەیام، هەر سروشتەکانی مرۆڤ بەتاك و بەکۆ سیفاتەکانی عەولەمی هەڵگرتووە، هەروەها دیاردەکانی سروشتیش، بەجۆرێك هەموو پێویستیەکانی بەشەری جیهانین هەر لە تیشکی خۆر و مانگ ئاوو و هەواو ئازادی و دادگەری و ڕاستی و...هتد، کە لە سەرەتای بەشەریەت لەشێوەی دەڤەری هاتووە تا لە پەیامی ئیسلام بووە جهانی، ئینجا عەولەمی ئیسلام لە ئامانج و پێکهێنان و سیستەمدا زۆر جیایە لەگەڵ عەولەمی بەشەری، بۆیە عەولەمەی ئیسلام بەناوی (عالمیه الاسلام) ناودەبرێ نەك (عەولەمە)، هەروەك (سمیر عاطف زین) کتابێکی بەناوی (عالمیه الأسلام ومادیه العولمه) هەیە.**

**2- عەولەمەی بەشەری، هەڵبەتە بەیام پێشڕەوی بەشەریەتە هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆمەڵگەش دەمێنێ هەر پێشڕەوە، بۆیە جیهانیەتی پەیام زیاتر لە (10) سەدە لەپێش عەولەمی بەشەری هاتووە و ئێستاش هەر ڤاکتەری مونافیسە بۆی، لەڕاستیدا عەولەمی شیوعیەت و عەولەمی سەرمایەداری جیانین لەڕووی مادیایەتی، یان وەك (تۆینبی) وەختی خۆی وتبووی، دوو ئاوازی یەك گۆرانین، دوو قۆناغیش نین و هەریەکە سەر بە دو سەربازگە و دوو سیستەمی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییش نین (لەگەڵ جیاوازی زۆری نێوانیشیان)، نەخێر بەڵکو هەردوولا سەر بە یەك عەولەمەی بەشەرین کە زادەی عەقڵی بەشەرین بەگشتی، ئەو عەولەمەی ئێستاش زادەی سەرمایەداری نیە بە تەنها، هەروەك بەشێکی زۆر واتێگەیشتوون بەتایبەتی ڕەوشەنبیری کورد وسیستەمی ئایدیۆلۆژیای زۆربەی حزبە ئەکتیڤەکانی کوردستانیش[226] .**

<u>**قەیرانی ناسنامە لە عەولەمە**</u> :( ئەو بابەتە بە درێژی لە چەمکی ناسنامە باسکراوە تەنها کەمیکی لیرە باس دەکەین)

---

[226] سەرنج بدە لە (ڕاپۆرتی سیاسی- کۆنگرەی دووەمی ی.ن.ك- ل2.) چۆن سەرمایەداری وعەولەمەومافی مرۆڤ وبازاری ئازادی پێك وەبەستوە .

له بنەچەدا عەولەمە ناسنامەی شارستانی و ڕەگەزی و جوگرافی و ئاینی نیە، هەرەوەزی هەموو کۆمەڵگەی کۆن ونوێیە،قۆناغیکە لەشارستانی، بەڵام ڤاکتەری لایەنێکی زیاتر بەسەردا زاڵە، ئەوەش بابەتی (پێشڕەوایەتی و سەرکردایەتی عەولەمەیە) نەك خودی عەولەمە، لەوەیان دا بە سەلبی دەگەڕێتەوەو کێشەکانی (ناسنامە) و (هەیمەنە) و (تقزم) دێتە پێش و دەردەکەوێ ئەو عەولەمەیە (یان ئەودێیە بچووکە) دروست نیە ئەوەندە بەباشە باس دەکرێ، یەك ڕەنگ و یەك ئاست و یەك تەرازوو.. نیە بەڵکو لەو دێیە (برسی و تێر، ڕەش و سپی، سەروو و خواروو، دەوڵەمەند و هەژار، کێخوا و خزمەتکار، ئازاد و دیل، خاوەن و بەندە،...)هەیە، بۆیە ئەو عەولەمەیە ئایدیۆلۆژیشە، پێکهاتووە لەدژو لایەنگیری، (تەنزیری) بۆ دەکرێ هەروەك ئەو تیۆرەی (شارستانی-هندگتۆن) و (مێژووی - ڤۆکۆیاما)، کە خۆی دەنوێنێ لە : وڵاتانی سەرمایەداری باڵا و کۆمپانیا باڵاکان، چینە دەوڵەمەندە کۆمبرادۆرەکان، لایە نی مادی خواز.. دژەکانیش بریتین لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو، چینی هەژار بەگشتی کە زۆرایەتی پێك دەهێنن، لایەنی ئاینی..

مەترسی لەسەر ناسنامە لە کاتی کارلێکی فەرهەنگی وکەلتووری وئاینی ڕوودەدات ،لە زەمینەیەك ڕوودەدات کە ناسنامەی کلاسیکی لەرزۆك بوە ، ئینتماکلاسیکیەکانیش پتەو نەماوە مادام پەیوەندی نێوان مرۆڤ ونیشتمان لاواز دەبێت لە عەولەمە ،ئینتما نەتەوەیی ونیشتمانیەکان بەرەو جیهانیە ، کە ئەوەیان لە راستیدا سەرەتای کۆتایی ئینتماو وەلای ستونیەکانە بۆ ئینتمای ئاسۆیی، ئەوەش کۆمەڵێك گۆڕانکاری قووڵ لەسەرخان و ژێرخانەوە لەگەڵ خۆی رادەپێچێ، .. لەهەمووی گرنگ تر ئەوەیە پانتایی( ئینتمای موکتەسەب- وەلا) جووت نامێنی لەگەل پانتایی (ئینتیمای میراتی)، بەلکو (وەلا) لە ئینتما جیا دەبتەوە بە یەکجاری ..لێرەوە جاریکی تر ڕۆلی ئایدیۆلۆجی و باوەڕ دێتەوە مەیدان بۆ ئەو وولات ومیلەتانەی لە شارستانی و فەرهەنگ وتەکنیك لەدوان ،ئەو دەرفەت ودەربازە زیاتر بۆ میلەتانی ئیسلام هەیە ، کەواتە **عەولەمی بەشەری کاریگەری لەسەر ئاین(بەگشتی) هەیە بە ئیجابی،** ئاینی مسیحی متمانەی بەخۆیە بۆ ئەو قۆناغە ،لەلایەك ئەوەندەهەڕەشە نیە لەسەر سەرخانەکانی لەلایەکی تریش ڕەهەندە جیهانیەکەی زیندوو دەبێتەوە ،بۆیەش کەمتر لای ئاینی مسیحیەکان ئەو هەستیاری ودوودلیە بەرامبەر عەولەمە هەبوە ،بابە

شنۆدەی سێیەم لەبابەتیکی بەناونیشانی (العولمة: فوائدها وتأثيرها وأضرارها) تيايدا دةلیَ: عەولەمە تەنها بریتیە لە کردنەوەو شکاندنی بەربەستەکان لەپیش هەمولایەکمان،العولمة هي انفتاحنا على باقي بلاد العالم, وانفتاحها هي علينا, وكسر الحواجز الفاصلة...زۆربەی ئاینەکانی تریش لەباریکی ئاساییدان بە دوو هۆ، یان ئاینەکە تەنها هەندی بیرورای تایبەتە بە هەرکەسێك ،یان ئەوەتە خۆی بۆ ئامادە کردوەو کیشەی لەگەل زانست وتەکنیك وشارستانی نیە ، هەرچی ئاینی ئیسلامە خاوەنی تەشریعەو چارەی سەرتاپایی داوەو کەچی پەیڕەوانی قەتیسیان کردوە لە بواریك وباقیەکەی تر کەوتۆتە پانتایی ڕبووردوو ،ئەو کاتە عەولەمە هەڕەشە دەبێت بۆ ئەو تیگەیشتنەی ئیسلام ، نەك ئیسلامی ڕاستەقینە ، چونکە ئەو عەولەمەیە لەجهانی ئیسلامی جارێکی تر ناسنامەیەکی ئیسلامی جهانی دەداتەوە تاك و کۆمەلەکان، هەم رەهەندە جهانیەکانی ئیسلامی زیندوو دەبیتەوە لە جیاتی رەهەندی دەڤەری ونەتەوەیی ومیژووی (کە فقه وا قەتیسی کردبۆوە)..ئەوەش تەکانیکی تری سەرباری بە هیزی ڕابوونی ئیسلامیە، یەکسەر دەبیتە هۆی قەلۆش بوونی مدرەسەکانی تریش ، چونکە مقەوەماتی رەدی عەولەمەیان لایە وەك خۆیان دەلێن و ئاماژە بە ئایەتی (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِين -هود: 118) ئیترتوانەوەی فەرهەنگ وزمان ومیلەتان لەیەك قاوغ بە محال دەزانن[227]، لیرەوە جەمسەریکی ئۆپۆزیسۆنی عەولەمی پەیدا دەبیت نەك دژی عەولەمی بەلکو دژی پیشڕەوو ڕێبەرانی عەولەمە ، بەو شێوەیە دەچینە نیو بڕگەی داهاتوو دژایەتی عەولەمە.

**دژایەتی فەلسەفەی عەولەمە:** بەشێك راستەوخۆ هێرش دەکەنە سەر عەولەمەو وا دەزانن خودی عەولەمە پلانە دژ بە ئاینی ئیسلام وعەرەب و زانایەکی زۆری ئاینی ونائاینی ئەو ڕایەیان هەیە ،مهاتیر محمد ئیسلام کریمۆف و محمدعابدالجابری و ..، هەمو ئەوانە پێیان وایە عەولەمە بەرجەستەی سیستەمی سەرمایەداریە، زیاتر لەوەش ناعوم چۆمسکی دەلیٚ ئەگەر بنچینە ئابووریەکەی سەرمایەداریە ئەوا بنچینەی پەیوەندیە دەولیەکانیشی لیبرالی دەبێت ، محمدشیرازی گەورە

---

[227] موسوعة الرد –باب الثالث –العولمة ص48

مرجعیکی ئاینی له کتیبی( فقه العولمه، دراسه إسلامیه معاصره) به دروشمی (لا للفقر)بلاو کرایەوه بەو ئارستەیە پالپشت دەکاتە سەر ووتەیەکی سەرۆکی فرنسی کە دەلیت عەولەمە درزیکی گەورەی خستۆتە نێو کۆمەلگە[229] ، سیستەمیك زالە بەسەر جیهان چینایەتیەکی توند بەرپا دەبیت ، هەندی نمونە لێی هەلدەبژێرین :

تێکرای قەرزاری وولاتانی هەژار(جیهانی سێیەم) تا سالی 1991 گەیشتۆتە1250ملیاردۆلارە ،682ملیار ئەمریکای لاتینی کەدەکاتە38٪، ئینجا وولاتانی ئاسیا بە ریژەی 32٪ ئەفریقا بە 16٪.. ئاماریکی تری دابەشی داهات بە پێی ژمارەی دانیشتوان لەسالی 1989 بۆ پینج بەش بە جۆریك بەشی یەکەمی هەرە دەولەمەند 20٪ی جیهان 82٪ی داهاتیان هەیە ، پینجەمی هەرە هەژار 20٪ تەنها 1٪ی بەردەکەوێ ،

لە کۆنگرەی زەوی (جوهانسبیرك 2002ز)، لە راپۆرتەکانی (un).. بەکورتی واهاتووە: خەلکی سەروو کە لە 20٪ دانیشتوانی سەر زەوی پێك دێنن، کەچی لە (80٪) دەخۆن، خەلکی خوارووش کە لە 80٪ی دانیشتوانی سەر زەوی پێك دێنن تەنیا لە 16٪ی داهاتیان بەردەکەوێ، ئاماری سەرسورهێنەری تر هەیە (173) کەس و کۆمپانیا لە (80٪)ی داهاتی جیهانیان بەدەستە و (6) ملیاریش تەنها لە 25٪، بەپێی( . Swiss Observatoire de la Finance) سویسری بۆ دارایی ئەوا800 دەزگا دەستی بەسەر نیوەی داهاتی جیهان داگرتوە، هەتا لە ناوەخۆشدا هەریەك دەولەمەندی ئەمریکی هەیە بە ئەندازەی (200) خێزانی ئەمریکی بەردەکەوێ[229]... بەشێکی تری نوێش (وەك مارکس) پێیان وایە پرۆسەی دیموکراسی بریتیە لەوەرچەرخان بۆ پلۆتۆکراسی (دەولەمەندەکان)بەتایبەتی لە ئەمریکا)[230] ...

ئەو هەمو داتاو بەلگەیەش هیشتا کۆتایی نیە بۆ ئەوەی وا تیبگەین ئەوە عەولەمە دروست کراوە بۆ کۆمەلە وولاتیك ، عەولەمە لە داهێنانی ئەمریکاوسیستەمی سەرمایەداری نیە،بەلکو قۆناغێکی

---

[228] ووتاری جاك شیراکی سەرۆکی فرنسا بەبۆنەی رۆژی نیشتمانی لە 14 یولیو 2000 .

[229] بۆ زیاتر سەرنج بدە: 1-امریکا طلیعة الانهیار- روجیە غارودی، 2-تقریر امم المتحدة لسنة1999، 3-قمة الارض–جوهانسبرك، جنوب افریقا.

[230] -p316 Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts

گەشەی مێژوە ، هەر ئەوەیە کەرەستەو تواناو تەکنەلوجی ئەوان بەسەر زاڵە, وایکردوە پێشڕەوو سەرمەشق بن لێی, ئەگینا عەولەمە قۆناغێکی مێژووی گەشەی کۆمەڵگەیە ،حەتمیە هاتنی, واتا لە هەناوی گەشەی پێویستیەکانی کۆمەڵگە دێتەبوون, ئەگەر کەمێك بگەرێنەوە بۆ یاساکانی گەشەکردن کەلەکتێبی (ڕەوشی فەلسەفی سەدەی 21)باسمان کردووە, ئەوا لەیاسای ژمارە(3) دەبینین لەگەڵ ڕەوتی گەشەی هەر سیستەمێك بەرەبەرە هۆکارەکانی ناوەکی زیاد دەکاو هۆکاری دەرەکی کەم دەکات, یان بەدیوێکی تر هۆکارە ناوەکیەکان (گرینگایەتی)لە هۆکاری دەرەکی وەردەگرنەوە, ئەو پرۆسە یاساییە ڕێك لە نێو هەناوی کۆمەڵگە پەیرەو دەبێ, لەسەرەتای کۆمەڵگە هۆکارەکانی دەرەکی رۆڵی زیاترە لە ناوەکی, ئەوەش گوزارش لە قۆناغەکانی سەرەتای پەیوەندیەکۆمەڵاتی و رەچەڵەك لە ئادەمیزاد دەبینیێ, لە بەرهەم هێنانیش رۆڵی ماسولکە گرینگ بوو نەك عەقلانیەت, ئەو جۆرە کۆمەڵگەیەش پچرپچرو لێك دوورو بێ ئاگا لە یەکتر بوون, کەمتر کارلێکەکان دەگەیشتە سەرانسەری, بۆیە هەر کۆمەڵگەو ڕەوە بەشەریەك ناسنامەو داب و نەریت وئاینی جیاجیای هەبوو.

ئالەوێ پێویستی بەوە هەبوو لە هەموو شوێنێك پێغەمبەرێکیان بۆ بێت وبەردەوامیش بۆیان بێت, لەگەڵ زیاد بوونی رۆڵی ناوەکی و دروست بوونی زیاتری تۆڕی پەیوەندی ناوەخۆی ئەوا خێرایی گەشەی کۆمەڵگا زیاد دەکاو بەرەبەرە هۆکارە ئاسۆییەکانیش دێتە پاڵ هۆکارە ستوونیەکان و پەیوەندیەکان بەهێزتر دەبن, ئەوحالەتەش کۆمەڵگەیەك بە بەرهەم دێنیت کە تێکەلی و کارلێك کردنیان لەناو دروستا دەبێ, ئەو پچرپچڕەی جاران نامێنێ, پەیوەندی و دووریەکان سنورداردەبن و سەرەتای عەولەمە لێرەدا دەست پێ دەکا, لەوکاتەوە ئەو هەموو پێغەمبەرەش پێویست نابێت بەژمارەو نەبۆ بەردەوامیش, واتا کۆمەڵگا ئامادە دەبێت بۆ گەشەی هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمان, بە مانای دوا پێغەمبەر, بەو شێوەیە ئاینی ئیسلام دێتە بوون بە تەواوی ڕەهەندەکانی عەولەمە, بەڵام هۆکاری بەشەری دوای دەخا(ووردتر تاڕادەیەکی زۆر فقە دوای خست) ئەگینا دەبوایە لە ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامی عەولەمە سەرهەلبدا ، کەچی لە دیوێکی تری زەمین عەولەمە سەر هەڵدەدات، لە ناو جەرگەی تەکنۆلۆجیا..... بەو شێوەیە عەولەمە بەفاکتەری چالاکی تەکنۆلۆجیا هاتە مەیدان.

دەشێ فاکتەری چالاکی عەولەمە فاکتەری تری وەك: ئەخلاق, دادگەری, مرۆڤایەتی, یەکسانی... جیهانی, .. عەقلانی, ...بێت ، بەبوونی هەر یەکێك لەو فاکتەرانە جیهان وەردەگەڕێ لە عەولەمەیەکی لێخوڕدراوی سەرمایەداری رۆژئاوایی بۆ جۆرێکی تر لە عەولەمە, بەڵام چێوەی عەولەمە ناگۆڕێت ئاڕاستەکەی دەگۆڕێت, وێکچوی پەیوەندی دەوڵەتە بەحکومەت,حکومەت دەگۆڕێ ودەوڵەت وەك خۆیەتی,جا ئەگەر دیموکراسی عەولەمی هەبێت دەبێت دەست گۆڕی فاکتەرەکان بکرێت, کاتێك دەبینین فاکتەری (تەکنیکی) حاکمە لە عەولەمە کێشەی کۆمەڵگا هەر زیاد بکات, ئەوا پێویستە لە چوار چیوەی ئەو دیموکراسیە عەولەمیە ئەو حوکومەتە بگۆردرێت بۆفاکتەرێکی سەروو باسکرا, ....ئەوەش پەیامی عەولەمەیە کە لەگەڵ خۆی هەڵی گرتووە لەدوا قۆناغ سپاردەی فاکتەری دادگەری دەکا.

(6)

## مەدرسەکانی عەولەمە– (صراع البدائل) –ڤاکتەرەکان

لەسەروو باسی لایەنی گشتی بەشەریەتمان کرد کە هیزی عەولەمی لەگەل خۆی هەلگرتوە، بەشەتایبەتی و (کەمالیاتەکەی) زادەی مرۆڤ خۆیەتی، ئەویش لەگەڵ گەشەی کۆمەڵ بەرەبەرە بڕگەی لێ دەبێتە جیهانی وکەمالیاتی نویش دیتە جێی، هەر بۆیەش مەبەستەکانی پەیامی ئاسمانی لە کۆتاییدا جیهانییە، هەروەك قۆناغەکانی پەیام لەرێی پێغەمبەرەکان(د.خ) واهاتووە لەسەرەتا بۆ بنەماڵە ئنجا بۆ نەتەوە و چینێك ئنجا بۆ ناوچەیەکی فراوانتر تا لەدوای (ئیسلام) بۆ هەموو جیهان هات، هەروەها بانگی ئیسلامی سەرەتایش بەو قۆناغانە ڕەت بوو. بۆیە ئاینپەروەری ڕاستەقینە ئەندامێکی جیهانیە،تەنانەت دەتوانین بڵێین هاوولاتیەکی گەردوونیە، نەك ڕەچەڵەکی و نیشتمانی ودەڤەری ، مادام سروشت و ویست و ئارەزووی بەشەریەت هاوبەشە، ئەوەش بناغەیەکی بەهێزی عەولەمەی ئێستایە، جا چۆن هەر ئادەمیزادێك کۆمەڵێك ڤاکتەری ئیجابی و سەلبی کاری لێ دەکا بە قەبارەی جیاجیا، ئاواش کۆمەڵگە بەو ڤاکتەرانە کاریگەرە.

لە ڤاکتەرە سەلبیەکان: ئابووری زیادەڕەو، بەرەژەوەندی تایبەتی، خۆویستی، چینایەتی، نەژاد و ڕەگەزپەرستی...

لە ڤاکتەرە ئیجابیەکان: ئایدیۆلۆژیای دادگەری، بەرژەوەندی گشتی،هاریکاری ،مرۆڤایەتی ... بۆیە شان بەشانی یەك لەڕەوتی تەمەنی عەولەمەدا چوار مەدرەسەی سەرەکی فکری و سیاسی خەملیوە، هەریەکە کۆمەڵێك چارەسەر و ڕێبازی تایبەتی خوی هەیە بۆ بەرنامەی ژیانی تاك و کۆ، ئەو مەدرەسانەش زاوزێو کارلیکی هەبوە لەگەل کۆمەلێك تیۆری سیاسی و فەلسەفی و کەلتوری فەرهەنگی کە لەسەرەتای ڕێنیسانسی جیهانی سەری هەڵدا، چوار مەدرەسەی سەرەکی خەملاند لەکۆتاییدا وەك بەدیل بۆ یەکتر لەجیهانی نوێدا،مدرسەکان بریتین لە: 1- لیبرالی 2- شیوعیەت 3- سۆشیالیستی 4- ئاینی.

1- **مدرسەی (لیبرال دیمکراسی)** ئەو مەدرەسەیە لە شەبەنگێك تیۆر و فکر و ڕاڕەوی ئایدیۆلۆژیا و ئاینی و زانستی جیاجیا پێکهاتووە، مێژوویەکی تیۆری کۆنی هەیە (لەپێش زایین)، نزیکە لەو کۆمەلە هاوبەشەکۆنەی پیکهاتوو لە زانست وئاین کەپیی ووتراوە (کویکرز)، بەڵام پەیرەو بوونی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری دا هەموو ئەو زانا و فەیلەسوف و مەدرەسانە دەگرێتەوە کە بەشدارن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕش بەسەر دەسەلاتی کەنیسە بەتایبەتی فکری (دیکارت)، (فرانسیس بیکۆن) (ڕۆسۆ) تا دەگاتە دوورەکەیان لە سیاسەت کە (تیۆری پەرەسەندنەئەوە یان لە ئابووری، (دورکایم و کرۆتچە) لە کۆمەلایەتی و (سپینر) لە گەشەکردن (وجودیەکان) لەبارەی سەربەستیدا.. هەریەکە یان وەستای کارامەی ئەو مەدرەسەن .

هەرچەندە پێشتر سەرمایەداری وەك نەخۆشی و ئافات سەیر دەکرا، بەڵام لەدوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی سۆشیالیستی، لە سەدەی نوێ سەرمایەداری جارێکی تر وەك ئایدیۆلۆژیا و عەقیدە هاتەوە مەیدان وەسفی بە (کۆتایی میژوو)دەکرێ، پیشیان وایە بەو ئاڕستەو لەسەر بنچینەی لیبرالی ناسنامەی نیشتمانی و ئاینی وسیاسی لەگەل یەك کارلیك دەکەن ودەتوێنەوە ، بەرەو حکومەتیکی جیهانی ،تەنانەت لە( معجم القرن21 ) دەلیّ عەولەمە زیاتر ئاشتی دەهێنی چونکە ترس لە

تەكنیكی شەڕ زیاد دەكات ودەبتە مالویرانی  پیشی وایە حكومەتی جیهانی ئاشتی دەبیت وعەولەمەش بەو ئارستەیە[231] ، ئەوەش دیویكی تری بۆ لیبرالیەت زیاد كرد كە هەمو لایەك بلێن بەلای كەمی لەو دەمە لیبرالیە ڕابەرایەتی عەولەمە دەكا .

ئەو مدرسەیە وا دەڕوانێتە ژیان كە سەربەستی لە بیرۆاو كار و ماڵداری تاك خوی لە خویدا كۆمەڵگەیەكی ئازاد و داهێنەر دروست دەكا، لەكۆتاییدا هاوسەنگیەكی كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و دەروونی بە ئارامی دروست دەكا، ئەوەش چاكترین دادگەری مومكینە، (ئادم سمیس) وتوویەتی: بەختیاری گشتی دێتەدی كاتێك هەركەس بەدوای بەرژەوەندی خۆی بێت،  ماوەیەكی دوورودرێژە لە ڕۆژئاوا پەیڕەو دەكرێ، بووەتە پاڵپشتێكی بەهێزی كەلتوورونەریتی سیاسی و ئابوریو كومەلایەتی ...، لە چوارچێوەی بنەمای فراوانی (بەرژەوەندی) دەنوێنرێت، كۆمەڵگەیەكی پراگماتیت بۆ دروست دەكا،  (هەژار و دەوڵەمەند) (وڵاتی هەژار و وڵاتی دەوڵەمەند)ە، (بەهێز و بێهێز)دروست دەكا كە كیشەیەكی عەولەمەیە .

لەبەرامبەر ئەوبنەما كوشندانە بووە لەدوای هەردوو جەنگی جیهانی لە ساڵی 1948 كۆمەڵێك (مەبادیئی مافی مرۆڤ)ی لێ جاڕدرا وەك لایەنی ئەخلاقی ئەو مەدرەسەیە، ئەگینا هیچ بنچینەیەكی ئەخلاقی تیا نیە لە تیۆر و پەیوەندی و حوكمی دیكتاتۆری بەرژەوەندیدا.

**2- مدرسەی شیوعیەت : تكایە بڕوانە چەمكی (ماركسیەت) لەو مەوسوعە .**

**مەدرەسەی سۆشیال دیموكرات :** بیرۆكەی سۆشیالیستی  دەگەڕێتەوە پێش زایین، نەچووبووە قاوغێكی داڕشتنەوە بەو شێوەیەی ئێستا تا لە سەدەكانی دوای (16) دەستی پێكرد، بەپێ (موسوعە لالاند) یەكەم جار (پیار بویر) سۆشیالیستی بەكار هیناوە لەدژی (فردیەت) ،هەندیكی تر دەلین سانسیمۆنیەكان دایان هینالە گۆڤاریك بەناوی (ئاین)بەمانای بەرژەوەندی گشتی دژی خۆویستی بەكاری هێناوە،هەرچی سۆشیالیستی تۆباویە ئەنجلس دایهینا[232]،  هەندیكی تر دەلین تۆماس مۆر

---

[231] معجم القرن21 ص112.

[232] موسوعه لالاندالفلسفیه ج3 ص1302و ص1518

دایهینا. له سەرەتادا زۆر جۆرە سۆشیالیستی گەڵاڵە کرا: (سۆشیالیستی تۆباوی، سۆشیالیستی نەتەوایەتی،سۆشیالیستی دیمکراسی،سۆشیالیستی برجوازی،سۆشیالیستی نێونەتەوەیی، سۆشیالیستی ئاینی، سۆشیالیستی زانستی...)، لەدوایدا تەنها دووجۆرە سۆشیالیستی بوونە ئەزموون (سۆشیالیستی زانستی- سۆشیالیستی دیمکراسی)، دیارە سۆشیالیستی زانستی هەر هەمان مەدرەسەی مارکسیزمە، وەك جۆرج پۆلیتزر دەلیت(إذا نظرنا للماركسية في مجموعها (النزعة المادية الجدلية، النزعة المادية التاريخية، الاشتراكية العلمية)[233]، یەکەم ئەزمونیشی لەروسیا لەدوای شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917 دەست پێدەکا ، هەرچی سۆشیال دیمکرات لەلایەن پێشڕەوانی وەك (فۆریێ- 1772)، (سان سیمۆن 1760- 1825)، (لاسال 1825- 1864)، (برنشتاین 1850- 1932)، (کاوتسکی 1854- 1938).. دارێژرا، ئەوانە بەکورتی پێیان وایە بۆ گەیشتن بە دادگەری کۆمەڵایەتی و گواستنەوەی سەرمایەداری بۆ سۆشیالیستی بەرێگەی ئاشتی و پرۆسەی دیمکراسی و چاکسازی ئابووری دەبێت،وەك مەدرەسەیەکی سێیەمی نەسەرمایەداری نەشیوعی دەرکەوتن،لەلایەن هەردوو مەدرەسەی مارکسی وسەرمایەداریش هێرشیان کراوەتە سەر مارکسیەکان(بەتایبەتی لینین) بە دوو ڕوو و(مورتەد) وەسفیان کردوون،هەرچی بەرەی سەرمایەداریە (بەتایبەتی وەسفی تۆکفیل)دەڵێ سۆشیالیستی ودیموکراسی تیکەل نابن ،لەدیموکراسی ئازادی ومەخەیەری لە سۆشیالیستیا موقەیەدی وموسەیەری،بەلکو دژی یەکن مەگەر لە یەکسانی بگەنەیەك[234] ،سۆشیال دیموکراتەکان لەسەردەمی جەنگی ساردو گەرمەی مارکسی دەیان ووت جیاوازیمان لەگەل مارکسیەکان ئەوەیە ئیمە بە ئاشتی ودیموکراسی سۆشیالیستی پیادە دەکەین ،بەلام دوای شکستی شیوعیەت گەرانەوە سەر پەیرەوی برنشتاین وتەواو جیا لە مارکسی ونزیك لە سەرمایەداری ،برنشتاین دوای هەلگەرانەوەی لە مارکسی لە کتیبەکەی (الاشتراكية النظرية والاشتراكية الديمقراطية التطبيقية) ووتی (ئەو قەیرانانەی لەسەرمایەداری ڕوودەدا نابیتە هۆی ڕووخانی و جیگرتنەوەی پرۆلیتاریا) سۆشیالیستی دیموکراسی لە چوارچیوەی سیستەمی

---

[233] ج بۆلیتزر- اصول فلسفه الماركسيه –الدرس14 ص260

[234] لەبارەی ئەو ڕایانەی توکفیل بڕوانە: فریدریك ئای هایك- الطريق الى الرق ص39

سەرمایەداری دەبێت[235] ..، بۆیە لەدوای دارمانی شیوعیەت لە 1990 بەدواوە سۆشیال دیموکراسەکان زیاتر بەرەو نەریتی لیبرال دیمکراسی و سیستەمی سەرمایەداری لاربوونەوە، تا ئەو رادەیە خۆیان ناکەنە خاوەنی ئەزموونی شیوعیەت و چەپی بەگشتی و هەتا مێژووەکەی خۆشیان، کە تا رادەیەك خاوەنی بەرنامەیەکی رادیکالی بوون،بۆیە دەست نیشان کردنی بنەما فکری وسیاسی وکارنامەی بۆ کیشەکانی کۆمەلگەی سەردەم ئەوەندە ئاسان نیە ،هەندیکی دیاری دەکەین :

بە جیا لە سۆشیالیستی زانستی (مارکسی) باوەریان بە وە هەیە دەولەت بمێنیێ وئامرازیکی خۆشگوزەرانیە ،لە رووی دیموکراسی و بەشداری پەرلەمان و دەزگا سیاسیەکان و هەلبژاردن دەیانەوێ بەرنامە چاکسازیەکانیان جیبەجی بکەن، لەو روانگەوە پێیان وایە سۆشیالیزم لە دیموکراسی جیانابێتەوە، گۆران وچاکسازیەکانیان دوورەلە توندوتیژی ، باوەریان بە تەبایی چینەکان هەیە بەتایبەتی هەردوو چینی پرۆلیتاریاو برجوازی ، پێیان وایە دەشێت باری پرۆلیتاریا چاککرێت بەهێمنی بەهۆی چاکسازی پەیوەندی بەرهەم هێنان، بەو جۆرە هینانەدی سۆشیالیزم پێ بەپێ و بەقۆناغ بێتەدی نەك بە شۆرش و بازدان وتیکشکاندنی سەرمایەداری ، باوەریان بەهەردوو کەرتی تایبەت و کەرتی گشتی هەیە لەوەوە ناسنامەیەکی ئابووری تایبەت بە جیا لە سەرمایەداری وشیوعیەت دەدەنە خۆیان ،دەلێن سەرمایەداری گرنگی بەکەرتی تایبەتی دەداو شیوعیەتیش بە کەرتی گشتی ئێمە بە هەردوولا .

## 4- مەدرەسەی ئاینی

پیش ئەوەی بانگەوازی پیغمبەرەکان بەرزبێتەوە بنەمای ئایدیۆلۆجیای ئاینی لە پرسیارە فلسفیەکان لە ناخی هەمو عاقلمەندیك دروست دەبێت ، بۆیە لە هەمو ئایدیۆلۆجیەکی تر رەسەن و رەگ قوول تر دەبێت ، بواری جیبەجی کردن وپاساوەکانیان بە هیز دەبیت ،پێیان وایە یەزدان ئەو بونەوەرەی بەبینراو و نەبینراوەوە هەر لە ئەلیکترۆنێکەوە تا گەردوون بەپێی یاسای تووندوتۆڵ (مسەیەر کراو) دروست کردووە، ئێمە بە هەڵە (پێی دەڵێین یاسای سروشتی) واتە: 1- خلق، 2-

---

[235] بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بروانە : فرانسوا شاتلیە، دوهامیل،بیزلیە- معجم المؤلفات السیاسیە ص180-

هدی، لە شوێنی تر (خلق و تدبیر) یان (خلق وتقدیر) یان بە فراوانیەکەی (امر وخلق): مانای دروست کردن و بەرنامەدارِێژی (کە دەکاتە یاسا) نەك وەك (ئەرستۆ و زانایانی لاهوتی - ربوبی) بڵێین دروستکەرەو بەس، کە سەرچاوەی فکری عەلمانی ئێستایە، نەخێر لەو بوونەوەرە تەنیا ئادەمیزادە ئەو برِە سەربەستیەی پی دراوە[سمیر]، ئەویش لایەنە بەشەریەکەی (مخیر)ەو خۆی بەرپرسی کارو کردەوەکانیەتی، ئەوەش مادەکانی ئیمتیحانەکەیەتی، جا پەیامی ئیسلامی (هدی) بریتی یە لە درێژکراوەی ئەو کۆمەڵە یاسایانەی بوونەوەرکە هەمان خاوەنی هەیە، ئەگەر ئادەمیزاد پەیرِەوی ئەو یاسانە(شریعەت)ی کرد لە حوکم و ئابووری و معاملات و پەیوەندی.. ئەوا هەم لەسەر دنیا بەدادگەری و بەختەوەری دەژی و هەم لە ئیمتحانەکەش بە سەرکەوتوویی دەردەچن، ئەگەر لەجیاتی بەرنامەی تری دەستکردی پەیرِەو کرد، ئەوا هەم لەسەر دنیا ناگاتە ئامانج و دادگەری و ئاسودەیش نابینیێ و ئەو ئەنجامانەش دەبێت.

1- کارەساتی کۆمەڵایەتی لە چەوسانەوە و دەستدرێژی و جەنگ و برسێتی ..لەکۆتاییدا لەدۆخە هەرەباشەکەیدا دەبێتە خزمەتکار و چەوساوە و رِەنجکێش یان چەوسێنەر و زۆردار و رِەنجەرِۆ و یان بەهەردوو ئاراستە لە بارودۆخی جیاجیا.

1- هەر بەرنامەیەکی تر هەردەم: أ/ سەتحیە، یەك لایەنە، کورت بینە، مەودا کورتە، قووڵ نی یە، ئەنجامی لێك نەدراوەتەوە، چەسپاو نیە، محلیە، وەختیە ب/ ناگونجیَ لەگەڵ رِەوشت و رِسکانی ئادەمیزاد و یاساکانی بوونەوەر . ج/ بەشەکانی ئەو بەرنامە خۆبەخۆ ناکۆکن، چ جای پەیرِەوکردن و پیادەکردنەکەی.د/ هەرگیز لە دۆخی هەرە چاکی ئەو بەرنامەیەدا یەکێتی گۆتە و کردەی نی یە، ..ه- هەموو یاسا و نەریت و برِیارەکان لە دیفاکتۆ دەبێتە دیگۆرا، واتە هێز و (ئەمری واقیعە) یاساکانی دەستکرد دروست دەکا، بەپێی گۆرِانی هێز و هاوسەنگیەکان ئەو یاسا و رِێسا و برِیار و چارەسەریەکان دەگۆرِێن، بەپێچەوانەی یاساکانی ئیسلام چەسپاو و گشتگری زەمان و زەمینین لەوەو دادگەری دێتە دی و لە یاسای عەلمانیش چەوسانەوە... بەو شێوەیە خۆیان وا گەلالە دەکەن کە یاساکانیان رِەگی سروشت وگەردوونی

---

[236] ئادەمیزاد و شارستانیەتی جن ئیختیارن، بەڵام بابەتەکەی ئێمە ئادەمیزادە.

هەیە زۆر بە هیز ترە لە مەدرەسەکانی تر وجاری شوایە قایل نین ئەوە بە مەدرەسە ناو ببەین ولەگەل ئەو ڕیچکانە ریز بکەین ،پێیان وایە چارەنوسی عەولەمە دەکەوێتەوە دەست مەدرەسەی ئاینی ، کە لە بڕگەی داهاتوو چارەسەری دەکەین و لەبەر گرنگی دەیکەینە چەمکێکی سەربەخۆ بەناوی (صراع البدائل) کە چارەسەری پرسیاری (چارەنوسی عەولەمە لە ململانێی مەدرەسەکان) دەکات .

**ململانێی مەدرەسەکان :ململانێی ڕاستەقینە لە عەولەمە (صراع البدائل) لە نیوان ئەو مدرسانە**

مل ملانێی ڕاستەقینە لە دەوری تەوەرێك دەسوڕێتەوە، ئاخۆچارەنوسی عەولەمە لە ململانێی مەدرەسەکان لە قازانجی کام لا کۆتایی دێت ،  زۆردەستەوتاقم و تەیارو مەدرەسەو ئاین ..خۆیان وا گەلالە کردوە کە ئەوان چارەنوسی گەشەی کۆمەلگەن ، ئەو بانگیشەیە لەسەردەمی رۆم وفارس و میسری و لەو دواییە لە شۆڕشی فرنسی و تا ئیستاش بەردەوامە ، لە هەموان بەڕیکوپێك تر (هیگل) تیۆرێکی چارەنوسی کۆمەلگەی لە بارەی نەتەوەی (ئارمان)داڕشت[237] ،دەلێت لە سیستەمی نوێی جیهانی (ئەوسا) بەدواوە پیویستی کۆمەلگە وادەخوازێ ڕابەرایەتی جیهان لە دەست نەتەوەیی ئارمانیاوەبێت هەر لە دەست ئەوانیش دەمێنێ چونکە نەتەوەیەکی داهێنەر و پاك و شایستەن ، هەروەها مارکس ومەدرەسەی شیوعیەت (حتمیة التاریخ)ی بەهۆی کۆمەلێك بەلگەی بەهێزی زانستی و فلسفی و ئابووری داڕشت گوایە چارەنوسی کۆمەلگە لە (شیوعیەت) کۆتایی دێت و سەرمایەداری و باقی سیستەم و ڕێبازو ئاین و شارستانیەکانی تر شکست دەهێنن..،لەسەر ئەو بنچینەیە (هنری لوڤاڤر)کتیبیکی بەناوی (نهایە التاریخ) بلاوکردەوە پیش (نهایە التاریخ)ی فۆکۆیاما، لینین و باقی ڕابەرانی سۆڤیەتی پێشوو لە جەنگی سارد و گەرمیاندا لەگەلْ ڕۆژئاوادا دروشمی (ئیمپریالیزم مەرگی سەرمایەداریە)یان هەلگرتبوو، ئەو قۆناغەی ڕۆژئاوایان ناونابوو (ئیمپریالیزم) و گوایە ئەوە بالآترین شێواز و دوا قۆناغی سەرمایەداریە، بە ڕزگاری میللەتان

---

[237] بە عەرەبی ئەلمان هەلّەیەو کورد ناوی (ئارەمان)ی بردووە هەر لە ئەسلّیشدا خۆی ئەرەمانە نەك ئەلّمانیا، ئەسلّدا ڕەنگـە لـە ئاریمان هاتبێ و بە ئینگلیزی (german) لەگەلْ وشەی (کرمانج)ی کوردی لیّك نزیکن و ڕەنگە یەك سەرچاوەی هەبوو بێ.

ئیمپریالیزمیش دەڕوخێ و کۆتایی سەرمایەداریە.. حزبی بەعس و هەندی تەیاری عروبی دروشمیان (أمة عربية واحدة ذات رسالة خالدة) (خير الآمة)و یەهودیش بەناوی (شعب الله المختار) هەردوولا پێیان وایە (رساله الخالده) یە چارەنوسی کۆمەڵگە لە ژیر دەستی ئەوان دەبیت، و هەروەها هەریەکە لە (هال لیندرس)و (مولویل)و (روبرتسن) چارەنوسی میلەتانیان لە(جەنگی هەرمجدۆن) داڕشتووە لەسەر دەستی یەهودەکان، نایپۆل وهەرە دوای (ڤۆکۆیاما) جاڕیدا کە چارەنوسی کۆمەڵگەو ململانێی ئەو مدرسانە بە سەرکەوتنی سیستەمی لیبرالی وسەرمایەداری کۆتایی دێت و ووتی خەریکە کۆتایی هاتوە ، **لە( الموسوعة الأمريكية الأكاديمية):**هاتوە سیستەمی لیبرالی سەرمایەداری مرۆڤ خۆی خاوەنی خۆیەتی پیویستی بە دوعاو پاڕانەوە نەماوە تا ژیانی بۆ خۆش بکات خۆی وئەو عەقلە فراوانەی توانیویەتی ودەتوانێ گەشە بەهەمو شتیك بدات وهەموی لە قازانجی خۆی بەکاربهێنێ . ..لەگەل زۆر جۆرە گەلالەو بۆچوونی ترهەندیکی تری شوا بەڕێوەن .

لە وەها دۆخێکیشدا لە چوارچێوەی (صراع البدائل) لەنێوان ئایین و مەدرەسەکاندا ئەوەیان سەرکەوتو دەبێت کەبەڵگەکانی بەهێزە ،لەو جۆرە مللانێیە بالایانە تەیارو تەوژمە لاوازەکان بە جێدەمێنن وناگەنە ئاستی ئەو ململانێیە ،بۆیە دەبینین لە قاموسی حزبی بەعس کە بەفراوانی باسی جۆرەکانی ململانێی کردوە ، ئەو جۆرە چەمکە کەم تۆمار کراوە باسی ململانێی شارستانی وچینایەتی وفەرهەنگی وزۆری تر کراوە بەلام باسی ململانێی مەدرەسەکان نەکراوە ، ئەوانە بەناوی (استقلال ایدیولوجی) دەلێ من سەربەخۆم وسەر بە هیچ مەدرەسە نیم تەنها سودی لیوەردەگرم وبە پاریزەوە کارلیککردن دەکەین[238] ،حزبی بەعس و حزبەشۆڤینیەکانی تری نەتەوەیی (نازی وفاشی وتۆرانی وناسری ..)ئەو بانگیشەیان کردوە ،بەلام ئەگەر بە ووردی بیان پشکنی هەر ناوی حزبەکانیان پاشگرو ئاوەلناویان مەدرەسەیەکی پێوە بەندە وەك (حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیسی، حزبی سۆشیالیستی کوردستان، حزبی دیموکراتی ناسری، حزبی سۆشیالیستی نەتەوایەتی، حزبی دیموکراتی کوردستان، بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئیسلامی کوردستان،... هەتا (جمال عبدالناصر) داهێنەرێکی

[238] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص42،ص51

ناشیونالیزمی بەتوانابوو کەچی بە دیموکراسی وسۆشیالیستی ئایدۆلۆژی و پڕۆژە نەتەوایەتیەکەی پێ تەواو کردبوو، کەواتە ئەو جۆرە حزب و تەیارانەی بەو شێوە (چەند ڕەگیە) ناسنامەیەکی بۆخۆی پیکهێنابوو لەو ململانێیە دەردەچی .

لە ڕاستیدا پێویستیەکانی مرۆڤی نویٚ و کارلیك کردنی لەگەل یەکتر کۆمەلیك سنوری کۆمەلایەتی وجوگرافی وئاینی بەزاندوە ، بەرەو فۆرمات کردنەوەیەکی پەیوەندی نوێیە ، ئەو مرۆڤە کە ڕۆڵەی نەتەوەو دەوڵەت و بنەماڵەکەی نەماوە، بەڵکو ئینتمایەکانی (عابرالقارات)ە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو جیهان کارلێك دەکات، لەسەر ئەو بنچینەیە ململانێی مەدرەسەکان لە عەولەمە فۆرمیکی تر وەردەگرێت ، پیشوو تر هەبوە بە فۆرمیکی تر هۆکارە ستونیەکان بەشداربووینە لەو ململانێیەو دیاری کردنی سنوری ئەو ململانێیە ،واتە ئەو کاتی ئاین وئایدیۆلۆجیاو ئینتمای نەتەوەیی و نیشتمانی لەگەل مەدرەسەکە یەکێتیەکی پیك هینابوو بۆیە ئەو کاتی دەکرا بلێی ململانێی ئەورووپی وئاسیایی ،ململانێی سەروو وخواروو ،ململانێی رۆژهەلاتی ناوەراست و سەرووی ئەفریقا ئەو وولات لەگەل ئەو وولات دارولئیسلام لەگەل دارولحەرب ،بەلام ئەوەی ئیستا بەرەو ململانێیەکە تیایدا نیشتمان ونەتەوەو ئاینی کلاسیکی وهەریمایەتی نابێتە بنچینەی پۆلینی ئەو ململانێیە ، بەلکو ململانێیەکە لەسەر بنچینەی ئینتمای مەدرەسیە ،واتە هەمو لەگەل هەمو بەتێکەلی ولە تەنیشت یەکتر ، دەشیٚ یەکێك لە ئەمریکاو یەکێکی تر لە ئاسیاو ئەفریقا پیکەوە دژ بە عەولەمە بن لەهەمان کات یەکێك لە جیهانی ئیسلامی ویەکیکی ئەورووپی وئەمریکی پیکەوە لایەنگری عەولەمە بن ،بەو شێوەیە ئینتمای مەدرەسی نابەستریتەوە بە وولات وهەریم وکیشوەر، ئینتمایەکی (عابر القارات)ە ململانێیەکەش هەمان فۆرم وەردەگریٚ ، لێرەدا ئەو مەدرەسەیە سەردەکەویٚ کە چارەسەری تەواوی کێشەی بەشەریەتی هەلگرتوەو لایەنگرانی بە جوانی دەتوانن ودەزانن بەرجەستەی بکەن .

لەلایەکی تریش دەتوانین بڵێین  ئەو مەدرەسانەش مادام عەقیدە وشەریعەتیان هەیە، واتە (حلال و حرام) و ئینتمایان هەیە،بانگەوازو ئایدیۆلۆجیان هەیە بەدیلی ئاینن، هەر بەپێناسی زانستیانەی ئاین نەك بەروانگەی ئاینی (وەك کێشەکەی عودەی کوڕی حاتەم)، لەو ڕوانگەوە دەبینین فتوا دژی

شیوعیەت دەرچوە لەلایەن هەندێ زانای ئاینی ،لەوانە (ئایەتولامحسن الحکیم )-دەقەکەی: (بسم الله الرحمن الرحیم لایجوز الانتماء الی الحزب الشیوعی فأن ذلك کفر والحاد او ترویج للکفر والالحاد اعاذکم الله وجمیع المسلمین عن ذلك وزادکم ایمانا وتسلیما . والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته 17شعبان1379- محسن الحکیم[239] لەدوای ئەو (ایە الله محمدالحسنی البغدادی )فتوای دژی بوون بەشیوعی داوە ،زیاتر لەوە دەڵین داوای جهادی کردوە دژی شیوعیەت[240] .

کەواتە پرسیارەکی ستراتیژی قووت دەبێتەوە بۆچی لە نێو ئاینەکان واهەست دەکرێت تەنها ئیسلام لە ململانێیە لەگەڵیان، کەچی مەسیحی و یەهودی و بوزی و... بێدەنگن؟ پرسیارێکی گرنگی ڕابوون و ئەنسرۆپۆلۆژیاشە،نزیکە لەوەی باسی بالایی ئەو ململانێیانەمان کردوتیایدا کۆمەڵێك تەیاروحزب و ئایدیۆلۆجیا لێی بەجێمان (وەك لەسەروو باس کرا) لێرەش هەمان سیناریۆ ئەوجارە بۆ ئاینەکان دووبارە دەبێتەوە ،ئەوانەی گشتگر نین ناکەونە ئاستی ئەو ململانێیە ،ئاینەکان شان بەشانی ئاینی ئیسلام لە بارەی گەردوون وسروشت و بوون وئەسل وچارەنوس لە مەیدانن دژ بە لائیکی ودەهری ووجودی ، بەلام کە هاتە سەر ململانێی گەلالەی چارەسەریەکانی جیهانی ،تەنها ئەو ئاینە دەمێنێتەوە کە شریعەتی بەبەرگەی سەردەمی هەیە ،بۆیە وادەردەکەوێ جارێ لەو قۆناغە هەر ئاینی ئیسلام لەو ململانێیە بەتەنها بمێنێتەوە .

لەڕاستیدا هەریەك لەو مەدرەسانەی عەلمانی(لە عەولەمەدا) لە نوقستانی ئاینێك هاتووە، وەك علی عزت بیگۆڤیچ لە کتیبەکەی( الإسلام بین الشرق والغرب) گۆتەنی: لیبرال دیمکراسی بۆ تەواوکردنی مەسیحیەت هاتووە، سۆشیالیستیش بۆ یەهودیەت.. بەو تەعدیل و بۆیاخە نوێیە بەردەوامی چاکتر وەردەگیرێ، هەڵبەتە شیوعیەت لەهیچ ئاینێك نزیك نیە و ئاینێکی نوێ یە، هەرچی ئاینی ئیسلامە خۆی وەك پرۆژەیەکی تێروتەسەل گەلالە دەکا ، پێویستی بە شریك و تعدیل نیە، چۆن ئەو مدرەسانە دەیانەوێ لەو (عولمە)یە ببنە بەدیل، ئاواش ئیسلام بەرنامەکانی گەڵاڵە دەکات وەك چوار ئاینی جیهانی، لەڕاستیدا ئەو چوار مدرسەیە نوێنەرایەتی هەموو ململانێ یەکانی

---

[239] لاهوت السیاسة ص47

[240] العمل الاسلامی فی العراق ص35

ئاینی و چینایەتی و شارستانی و سیاسی دەکا، ئەگەر بەشێوازی جیاتریش گوزارش کرا، واتە ململانێی سیاسی سادە نی یە، ململانێی بەرنامە و عەقیدە و ژیان و تێڕوانینی گشتیە، چوار دنیای لێك جیایە، ئەوەیە ململانێ و تێکگەیشتنی ڕاستەقینە، نەك (صراع الحضارات)ی سامۆئیل هنتیگتۆن .

بۆ تێگەیشتن زیاتر لیستێکی تری بەراوردی بنەماکانی هەر چوار مەدرەسە دەکەین بەتێبینی لەگەڵ لیستەکەی پێشتر.

| شیوعیەت | سۆشیالیستەکان | | سەرمایەداری (لیبرالی-دیموکراسی) |
|---|---|---|---|
| | 1- سۆشیالیستی زانستی | 2- سۆشیالیستی دیموکراسی | |
| 1- مولَکیەت نامیَنآ.<br>2- خیَزان، دەولَەت، یاسا نیە.<br>3- دەزطای سیاسی دەولَەت کۆتایی دیَت.<br>4- ئازادی تاك مسةیەرة.<br>5- سەرکردة و بنکة نامیَنآ.<br>6- ئەخلاق و ئاین ثیَویست نامیَنآ، عةقیدةی شیوعیەت دةمیَنآ.<br>7- کۆمةلأ بآ ضینة و یةکسانیة. | 1- هةیة بةثیَی (کل حسب عمله)<br>2- بةرةو هةلَوةشانةوةیة.<br>3- دیکتاتۆری ثرۆلیتاریا دةمیَنآ.<br>4- ئازادی ضینایةتی هةیة، برجوازی، سةربةست نیة.<br>5- سەرکردة ثرۆلیتارة.<br>6- ئەخلاقی ثرۆلیتاریا دةمیَنآ.<br>7- ضینی ثرۆلیتاریا [illegible] | 1- هةمان شت لةطةلَ (عام، خاص)<br>2- دةمیَنآ (ڕوون نیة).<br>3- ثرۆلیتاریا+ دیموکراسی.<br>4- ئەخلاقی دیموکراسی+ بةرذةوةندی.<br>6- ئەخلاقی دیموکراسی+ بةرِذةوةندی.<br>7- ضینایةتیةکی هیَواش.<br>8- هةمان شت. | 1- بآ سنور هةیة ضۆنی ثةیدا دةکةی.<br>2- دةمیَنآ بآ دادطەری.<br>3- دیموکراسی سەرمایەداری و لیبرالیةتی کۆمةلآیةتی و ثةرلةمانی دةبیَت.<br>4- موتةلةق ئازادة.<br>5- ئیمتیازی زۆرة سەرمادارةکانن.<br>6- بةرذەوةندی لةسەروو+ مافةکانی مرۆظ. |

| ئاینی |
| --- |
| 1- سنوردارة (خاص+ عام)<br>2- هةیةو ثیرؤزة بةثێی مةبادیئی ئیسلام.<br>3- سیستةمی شورا+ ولایات+ ئیسلام حوجةیة نةك شةخصی و حزب.<br>4- سنوری هةیة.<br>5- سةرکردة ثیرؤزة و بآ ئیمتیازة و خزمةتکارة.<br>6- ئةخلاق و ئاین ناوةندیة. |

(7)

## پاشکۆیی (لاسایی - تبعیه ) Dependency

ئەوانەش دەگریتەوە (شروط الدورية، دواکةوتة، لۆرانس عرب، **پاستيك**(pastiche)، ئەرسنال ، نيوكۆلۆنياليزم — ئيستعمارى نوێ،..)

ئەو چەمكە زۆر فراوانە مانايەكانى سروشتى وكۆمەلايەتىو سايكۆلۆجى وسياسى وياسايى دەگرێتەوە ، بە عربى (تبعى)و بە ئينگليزى (Dependency) يان (Vassalage) وبە روسى (зависимость ж)..،لەهەمو زمانيكدا هاوتاى زۆرە لەكوردەوارى پاشكۆيى خەست دەروێشى پێدەوتريت،يان كلكايەتى پێگۆتراوە لەبارە سەلبيەكەى،لە عربى (ملكى اكثر من الملك) هەيە ،نمونەيەكى زۆر بلاو لە كوردستان ولە وولاتانى دەوروبەرى زۆر لاى جيهانى هەيە ،گوايە لە مۆسكۆ باران باريوە كەسێكى شيوعى لە وولاتەكەى خۆى چەترى هەلداوە ،مەبەستيان لە پاشكۆيەتيەكى پەتيە ، لە قورئانا پاشكۆيى بەو ڕێنماييەى فرعون گوزارش كراوە ( ما أريكم إلا ما أرى وما اهديكم إلا سبيل الرشاد ) ،ئەو چەمكە زۆر بەتوندى پەيوەنديدارە بە 3 چەمكى تر ( دەردى لاساييوپيشڕەوايەتى و تقزم الثقافى ،ئەيتيما(atima)...دوەكەى دوايى دەكەينەوە چەمكيكى سەربەخۆ لەدوايدا،چونكە پاشكۆيى ڕێك پيچەوانەى پيشڕەويە، زۆر جۆرە پاشكۆيى هەيە (پاشكۆيى سروشتى وەك هۆكارو ئەنجام ،پاشكۆيى كۆمەلايەتى ،پاشكۆيى ئابوورى ،پاشكۆيى سياسى ،پاشكۆى فەرهەنگى ..، ئەوانەش لە ناوەخۆ پەيوەنديان بە يەكەوە هەيە ،بەشيكى زۆر پێيان وايە زۆربەى پاشكۆيەتيەكان لە پاشكۆى ئابوورى دێت .

مەرج نيە پاشكۆيى هەر لە ئەنجامى داگيركارى بێت زۆربەى جار(بە تايبەتى لەو سەردەمە)بە هۆى دواكەوتن ولاوازى وكەمى كەفائەت دەبيە پاشكۆ ،بۆيە تاڕادەيەكى زۆر پاشكۆيى هەم لەگەل داگيركارى جيايە هەم لەگەل كريگرتەييش ، بۆيە پيناسيكى ديارى كراوى هەيە ئەوەندە تيكەل ولێكجيا نين ،هەنديكى لێ هەلدەبژيرين :

+فەرهەنگى شوانى كوردى: بە (بارگەى پشت سوار )ووتراوە پاشكۆ.

+معجم المعانى الجامع: كون الشيء تابعا لغيره

+موسوعة علوم الاجتماعية :پیناسیکی كۆمەلايەتیكردوەو دەلێ :رێك پیچەوانەی ئیعتمادكردنە سەرخۆیە [241].

+ الموسوعة المصطلحات السياسية: سیستەمیكی سیاسی وئابوری وایە وولاتیك دەكەویتە ژێر كاریگەریەكی ڕاستەوخۆی یەكەم ،بە جۆریك ئەوەی دوەم سەروەری نامێنێ .

+مصطلحات جغراقية: التبعية الاقتصادية ارتباط الاقتصاديات الوطنية بعجلة الاقتصاد الأجنبي الأكثر تطورا.

+الموسوعة العربية : التبعية Vassalage هي ظرف موضوعي تشكّل تاريخياً، ينطوي على مجموعة علاقات اقتصادية وثقافية وسياسية وعسكرية، تعبر عن شكل معين من أشكال تقسيم العمل على الصعيد الدولي، توظّف بموجبها موارد مجتمع معين لخدمة مصالح مجتمع آخر أو مجتمعات أخرى[242].

+كتاب التبعية الاقتصادية: وينصرف مفهوم التبعية الاقتصادية إلى العلاقة غير المتكافئة بين الدول المتقدمة والدول النامية القائمة على الاستغلال والتبادل غير المتكافئ وأسلوب الاستثمارات والمعونات التي تشكل عودة للاستعمار الجديد[243].

زۆر جاریش بە پەیوەندی نێوان وولاتانی زلهیزو سەرمایەدارو وولاتانی جیهانی سێیەمیش دەووترێ پاشكۆیی یان (ئیستعماری نوێ).

<u>ڕیشەی پاشكۆیی لە جیهانی ئیسلامی:</u> ئاینەكان بەگشتی بۆ پاشكۆیەتی نەهاتون ،ئەوە هەلگری ئەو ئاینانەیە نازانن جوانی بنوێنن ودەكونە دواوەو پاشكۆیەتی ، لەو رۆژەی ئەو جۆرە فقهو سەلەفیەتە كەوتە جیهانی ئیسلامی كە عەقلانیەت وداهینان وزانست وفلسفە بوە توومەت ، ئیتر

---

[241] جۆردن مرشل- موسوعه علم الاجتماع ج1 مادە :تبعیه

[242] الموسوعة العربية —المادة:التبعية فی وطن العربی

[243] د. أحمد محمد أبو الرِّب، تحديات التنمية في الوطن العربي، ط 1 ص 64 .

شارستانی وفەرهەنگی بالاو داهێنان کەوتە دیویکی تری سەرزەوی ، زاراوەی پیشەنگ وپیشڕەوی نەما ،لە جیاتی زاراوەی ئەیتیماو دواکەوتە بوە میرات ،سەربردەی دواکەوتن ڕیشەیەکی قوولی میژووی هەیە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی بەدەوی کە شارستانی قەبوول نەبوە ،ئەو فەرهەنگەش زال بوو بەسەر حوکم ودوایش بەسەر فقهدا بەو شێوەیە دواکەوتە بینای پاشکۆیی تەئسیل بوو .

لەسەردەمی نوێ زیاتر لە کۆتاییەکانی عوسمانی پاشکۆیی بەرجەستە بوو کەناوی نرا پیاوە نەخۆشەکە[**] ، یەکەم جار لە ڕوەکانی فەرهەنگی ودەستوری تووشی ئەو پاشکۆییە بوون ،

معارەزەیەکی پان و بەرین لە نێو ڕەوشەنبیرە (تەغریبیەکان)ی عوسمانی واپەیدابوو، توانیان وا پێشان بدەن کەچارەسەری دەردەکانی عوسمانی بریتیە لە لاسایکردنەوەی ڕۆژئاوا، سوڵتان عبدالمجید لەساڵی 1839 بە نیمچە دەستورێکی هاوبەش (لە بنەماکانی شۆرشی فەرەنسا و شریعەت) قایل بوو ، نامق پاشا (کە لەدوایدا بوە سەرکردەی تورکیای لاو) دروشمی ئەوەبوو دەردەکانی عوسمانی بە چارەسەریەکانی ئەوروپا بەکۆتایی دێت، تا لە1865ز بوە بزوتنەوەی عوسمانی لاو، هەتا ئەو وەختەش هێشتا معارەزەیەکی گشتی بوو، (سولتان مراد) پێش سوڵتانیەتی وەك یەکێ لە بنەماڵەی سوڵتان لەگەل ئەو بزوتنەوەیە بوو، عوسمانی لاو گۆڕا بەتورکیای لاو(جوان تورك)، ئەو ناوەش هاوشێوەو لاسایی بەریتانیای لاو، ئیتاڵیای لاو، ئەڵمانیای لاو..هتد، بەو مانایەی دەوڵەتێکی تازە لەسەر بنچینەی تورکی دروست بکرێ، تورکیای لاو ئینقلاب بوو بەسەر عوسمانی بۆ تورکیایەکی نوێ هەروەك ڕوویدا لە 1908، دوایش لە بزوتنەوەکەی ئەتاتورك، تورکیای لاو لەسەر ترازی بزوتنەوەی کاربوناری ئیتاڵی کە لە سالی1807بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ نابۆلی ئیتالی سەری هەلدا، بە بەئەدەبیاتی شۆرشی فرنساش کاریگەربوو، دوای بە بۆنەی یادی 100 ساڵەی شۆرشی فەرەنسا لە1899/7/14 تورکیای لاو کرا بە (ئیتحاد الترقی) و لەساڵی 1908 ئینقلابیان بەسەر عوسمانی کرد، لەو کاتیەوە فەرهەنگ وسیاسەت وزۆربەی لایەنەکانی رۆژئاوا زال بوو بەسەر جیهانی ئیسلامی تا لە جەنگی جیهانی یەکەم بەیەکجاری داگیریش کرا .

---

[**]ـ یەکەم جار نیکولا قەیسەری ڕوسیا ناوی دەولەتە نەخۆشەکەی لە عوسمانی نا.

ئیتر نۆرەی وولاتانی عربی دێت کە لەسەر بنچینەی ئینتداب دروست دەکرین کە جۆرە پاشکۆیەتیەکی بێوێنەی دەولیە ،یەکسەر جیهانی ئیسلامی بەرەو پۆلی جیهانی سێیەم خۆیان بینیەوە ، زۆربەی وولاتانی جیهانی سێیەم میلەتەکانیان چۆن لەنگەی(جل وبەرگی کۆنە)میلەتانی جیهانی یەکەم دەکڕنەوە ،لەسەر ئاستی دەولیش وایە،نمونەی سنگافورە(کە لە لەو کاتەی لە جیهانی سێیەمبوو) کۆنە چەکی ئیسرائیلی کڕیوە لەسالی1968 دەبابەکانی ئیسرائیلی (AMX-13)کڕیوەتەوە[244] ، دەگۆترێ پاشکۆیی ئابووری دەبێتە هۆی پاشکۆی سیاسیش ،کەچی جیهانی عربی داهاتیکی زۆری ئابووریشی هەیە کەچی هەر پاشکۆشن . هەتا لە چارەی کیشەکانیشیان ،هەتا هەنگاوی لاسایی وپاشکۆیی زیاتر بنوێنن زیاتر بەرجەستەی دواکەوتەیی تر دەبن ، داود ئۆغلۆ(سەرۆك وەزیرانی تورکیا) پێی وایە پتەو کردنی ناو ناوەڕۆکی ئەو دەولەتە عربیانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست پیویستی بە لیکجیاکدنەوەی ئاین لە سیاسەت ودەولەت وفەرهەنگ وکردوە واشیان کرد بۆیە دەبتە سەرچاوەو قەیرانی دواکەوتەیی وناسنامەو زیاترین پاشکۆیی [245] ،ئیتر پاشکۆییش ئەوەندە قەیران زیاد دەکا تا دەگاتە قەیرانی عەقلی .

مانای ڕەهەندیەکانی :

ئەگەر چی مانای پاشکۆیی فراوان ترە بەلام کە وەردەچەرخێتە زاراوەیەکی نیودەولەتی ئەو کات مەبەستی وولاتانی دواکەوتوو و جیهانی سێیەمە لەبەرامبەر وولاتانی پیشکەوتو وجیهانی یەکەم ، یان بە وولاتانی دەوروبەر لەبەرامبەر ناوەند وەك لە ئەمریکای لاتینی وا بەکاردێت ،هەر لەویش ئەو چەمکە لە شەستەکانی سەدەی ڕابووردوو سەری هەلدا ، لە سەر ئاستی چالاکی ئابووریش بەوانە دەووترێ پاشکۆیی کە ئابووریەکەی وەستابێتە سەر یەکەم .

---

[244] لی کوان- من العالم الثالث الی الاول ص40.

[245] داودئوغلو-العمق الستراتیجی ص364.

به فراوانیەکەی بە هەمو ئەوانە دەووترێ (پاشکۆیی) کە ئیرادەی جولەو گەشەیان لە ناخی خۆیان نیە ، بەلکو بەدوای ڕێچکەی یەکێکی تر کەوتون ،لە سروشتا و لە ڕوانگەی فلسفی بە پەیوەندی (هۆو ئەنجام)یان (العله والمعلول)گوزارش کراوە،پیچەوانەی (اللازم والملزوم)کەهەردوولا تەواوکەری یەکترن،یان (شروط الدورية)ی پێدەوترێ ،لیرە تەەواوکەری یەکتر نین بە پاشکۆ بۆمانەوەی (پاشکۆدار) مەرج نیە ،بەلام پاشکۆدار بۆمانەوەی پاشکۆ مەرجە .

لە زانستی (تنميه البشريه) ناو لە پۆلە بەشەریە نراوە (مستەر عادی) کە هەردەم بەدوای پیخوستی خەلکی ترن، ئەو کەس وتاقمانەن کە پیشڕەو نین ،کارێك ناکا لە پێشەوەبیت،چاوەڕێیە تا کەسانی تر بەسەر کەوتوویی دەیکا، ئینجا ئەویش پێی هە لدەستێ ، لەو زانستە بە گشتی مرۆڤەکان دووبەشن بەشێکی کەمن ئەوانەی بە دوا نوسخەی واقع ڕازی نین ودەیانەوێ بیگۆڕن ،بەشە زۆرەکە بە پێی مەبدەئی (کلاوی خۆم گرتیە با نەیبا) چاوەڕێیە تا ئەو بەشە ڕێی بۆ دەکەنەوە، ئینجا هەنگاو دەنێ ،لەوەوە چینی یەکەم سەرکردەو زاناو پیشەنگی لێ دروست دەبێ لە دوەمیشا پاشکۆیی عەوام .

ئەو دەردە هەر قەتیس نەماوە لە جم وجۆلی تاك بەلکو بە ئالۆزی لەسەر ئاستی دەستەو تاقم و حزب وتا ئاستی نێو دەولەتیش هەیە، بەهەمان گەوهەری سەروو وولاتانی جیهانی یەکەم وجیهانی دوەم وسێیەم لە پیشکەوتنا دروست دەبێت ،ئەو وولاتانەی داهێنانیان نیەو پاشکۆن لە زانست وتەکنۆلۆجیاو شارستانی وسیستەم پێیان دەووترێ جهانی سێیەم ،ئەو دەردە زیاتر لە نێو میلەتانی ژێر دەستە بەرجەستە دەبێت بە هەمو ڕووکارەکانەوەو لەکۆتایدا کۆمەلیك دەردی تری لێ دروست دەبێت لەهەموان زەقتر دەردی لاسایی کردنەوەیە ،

لە فەرهەنگی سیاسی وئابووری سوفیتی پاشکۆیی و سەربەخۆیی پیچەوانەی یەکتر ڕێزدەکا ، پێی وایە لە رووی سیاسی مانای دەست بەسەراگتنی دەولەتیکەوە لەلایەن دەولەتیکی بەهیز وادەکا دەولەتی یەکەم نەتوانی هیچ سەروەریەکی ناوەخۆیی و دەرەکی نەمێنێ یان میلەتێك لە ژێر

داگیرکاری هەمان ئەنجامی هەیە،لە رووی ئابووریشەوە مەبەستی لە ئیمپریالیزمە[246] کە دەست بەسەر داهات وبازاڕو دراوی وولاتیکی تر دەگریٚ جاروایە بەناوی یارمەتی وگەشە پیدانی .شیوازی جیاجیادەگریتەوە ئینتداب ،وسایە ، ناوچەی ئیستەرلینی .. زۆر جۆرە هاوپەیمانیەتی تر ،پیشی وایە یەکەم جار پاشکۆیی ئابووری دروست دەبیٚت ئینجا سیاسی هەر بۆیەش تا لە ئابووریەکە رزگار نەبیٚت سیاسیەکە نایەتە دی .

هەندیٚکی تر ڕەت دەدەن وهەمو جۆرە پەیوەندیەکی ساغ ونەساغ بە پەیوەندی پاشکۆیی لیٚك دەدەنەوە ، لەوانە ئەلیسۆن لەبارەی (پەیوەندی خیزانداری وخانەوادە) دایکایەتیشی بە تەبەعیەت لیکدایتەوە ..بە هەمان رەتدان (موسوعەی سترانفۆرد) وای بۆچوە ، لە ڕاستیدا زۆر جۆرە پەیوەندی هەیە لە چوارچیوەی فلسفەی (هۆو ئامانج) مانای پاشکۆیی سیاسی نابەخشیٚ ئەگەر مانای سروشتیش ببەخشیٚ ، لە سروشتاو لە چالاکیە سروشتیەکانی کۆمەلگە زۆر جۆرە دیاردەی پەیوەندی هۆکارو ئەنجامی وا هەیە شیوەی پاشکۆیی وەردەگریٚ بەلام سروشتیەو هەردەبیٚ وابیٚت ، مندال لە خیزان ، تاك لەکۆمەلگەدا ،گەشەی عەقلی تاك هەموی لەسەرەتا بە قۆناغی لاسایی وپاشکۆیی دەڕوا ئینجا سەربەخۆ دەبیٚت ،ئەوانە لیك جیان ..نمونەی پاشکۆیەتی لە نیٚو هەمو میلەتیك هەبوە وبەشیکی زۆریشی ماوە، بەلام هیچ میلەتیك بە ئەندازەی کورد سازاو نیە بۆ تویٚژینەوە لەو بارەیەوە چونکە چەند سیفەتیکی تایبەتی هەیە :(لە جیهانی سیٚیەمە — لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستە — لە ژیٚرداگیرکاری عربیەو کەلتوری عربی ئاینی بەسەرا زالە —میلەتیکی ژیٚر دەستەیە..) بۆیە هەلوەستەیەکی تەواو لەویٚ دەکەین بۆ تیٚگەیشتن لەو چەمکە ، جاریش وایە کەوتۆتە ژیٚر کاریگەری پاشکۆی پاشکۆیان یان وەك شیعرەکەی مام هیمن بە دەستی دیلەوە دیلە .

<u>**دۆخی پاشکۆیی لە کوردستان:**</u> یەکەم جار میلەتانی عەرەب بە فراوانی تووشی ئەو دەردە بوون پیش میلەتانی تری رۆژهەلاتی ناوەڕاست، بە فەرمی لەسەرەتای سەدەی بیستەم عەرەب بە سیستەمی ئینتداب ڕازی بوون وشارستانی سیاسیان لەسەر بنیات نا ،یەکیٚکن لە میلەتە هەرە

---

[246] لە (موسوعە علم الاجتماع (کە تەرجەمەی فەرهەنگی ئۆکسفۆردە) دەلیت ئیمپریالیزم بەمانای (تەقەلای پیکهینانی ئیمپراتۆریەت) لەسەرەمی ناپلیۆنی سییەم ئەو زاراوە سەری هەلدا .

لاسایوانەکانی جیهان ،بێ داهێنانن ،ڕازی بوون بە ئینتداب مانای ڕازی بوونە بەوەی میلەتی بریتانیاوفرنسا مامۆستا بێت وعەرەبیش قوتابی ، ئەوان پیشڕەو عەرەبیش دواکەوتەو پاشکۆ، تەنانەت سەرکردە عەرەبەکانیش دەیانزانی کە دروست بوونیان بەو دەروازەو دێزاینە بۆ دواخستن وپاشکۆیەتیە لەکاتی دروست کردنیان لۆرانس عرب(بریتانیە بۆیە پێی ووتراوە لۆرانسی عەرەب چونکە سەرۆك ومیرەکانی عەرەب زۆر متمانەیان پێهەبوو گویڕایەلیان بوو تاڕادەی پاشکۆیی) ئەوەی ئاشکرا کردو ووتی بەشێوەیەك وولاتانی عربی دروست دەکەین کە نرخی سەنتەکیان نەبێت [247]،واش دەرچوو چەندین سەرۆکی عەرەبی لەدوای لۆرانس ئەوەیان دووبارە کردۆتەوە وولاتانی عربیان بە سفر نرخاندوە ، یەکەم جارسعد زغلول سفری بەکارهێنا دوای بە بۆنەی دروست بوونی (جامعەی عربی) بە شێوەیەکی فراوان گۆترا جامیعەی عربی بریتیە لە کۆی 22 سفر[248]،لە هەرەدوایش معمر قەزافی لەکۆنگرەی عربی لەبەغدا بەکاری هینایەوە ، ئیستاش پاشکۆیی وولاتانی عرب بەردەوامە ، لەو بارەیەوە(مکتب الثقافة والاعلام –حزبی بەعس) باس لە بارودۆخیکی ویرانی عربی وپارچەپارچەیی دەکا ،بە (متخلف)وەسفی دەکا،جیهانی عربی بۆ 4 لا دابەش کردە ،1-ئەو رژێمانەی بەیەکجاری چارەنوسی خۆی داوەتە دەست ئیمپریالیزم 2-جۆرە رژێمیکی تری تەبەعی دوور لەڕەچاوی بەرژەوەندی ئومەی عربی 3-رژێمەخینەتکارەکان 4-کۆمەلە رژێمیکی دواکەوتوی کۆنەپەرست[249] ،ئەو دەردە لە نێو عەرەب زۆرکوشندەیە (لە قەیرانی عەقلی عربی بەدریژی باسی دەکەین لەو مەوسوعە) .

ئەو دەردە بە جۆریکی ئالۆزو تراجیدیا تر هاتۆتە نێو کورد،بە هۆی داگیرکاری وشکست لە دوای شکست گەیشتۆتە ناخی تاکی کوردو یەکێکە لە میلەتە بێداهێنانەکان وتا ملانی لە پاشکۆیی ولاسایی نقوم بوە ، لەهەموان ترسناك تر ئەگەر پاشکۆیی ولاساییکەرەوەی کەلتووری سیاسی عەرەبی بێت کە خۆیان ئاوا دەرداوی بن ،جۆری لاسایی کردنەوەی کورد گەیشتۆتە دەردی (پاستیك–pastich)بەوانە ووتراوەلاسایی لاساییکەراندەکەنەوە[250]،کە ڕێك بەرجەستەکەی ئەوفەر

---

[247] کوتلوف- ثورة عشرین الوطنیة التحرریة فی العراق –ترجمة:د.عبدالواخد کرم ص211

[248] من قضایا الثورة والانسان العربي ص29.

[249] الثورة العربیة –مکتب الثقافة والاعلام عدد:8ص58 :

[250] بۆ زیاتر مانای زاراوەی (پاستکی)بڕوانە : معجم مصطلحات عصر العولمة ص84 .

مودەیە: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْراً بِشِبْرٍ وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَب لَسَلَكْتُمُوهُ ، قُلْ)، بەسەرنجێك بۆحزبە کوردستانیەکانی ئیستا بە ناوو ناوەڕۆك و هەڵس و کەوت و ناوی ڕۆژنامەو جۆری ئایدیۆلۆجیا هەتا جۆری گوتاری سیاسی.. دەبینی پاشکۆیی ولاسایی کردنەوەیەکی پەتی بیانیە بێ داهێنان ،لەزۆربەی دۆخەکانی (پاستکیە) ،بەزۆریش ئەزمونی سیاسی فکری عەرەبی بوویتە فلتەری،قۆناغی نوێی زیاتر ئەو دەردەی هەیە بە هەردوو ئاڕستەی عەلمانی وئاینی ، لەسەرەتا(لە 1976 بە دواوە) حزبەکوردستانیەکان بەئایدیۆلۆژیای ڕۆژهەلاتی سەرسام بوون ،تەنانەت ناوو دروشم وبلاوکراوەورۆژنامەکانیشیان کت ومت لەوان وەرگرتبوو، ئەو هەنگاوەشیان زیاتر لە ڕێی فکری عربی وەرگرت نەك ڕاستەوخۆ لە سەرچاوەکان:

**یەکەم لاسایی وپاشکۆیی ئایدیۆلۆجی** : ئایدیۆلۆجیای حزبە کوردستانیەکان بریتین لە سۆشیالیستی و لیبرالی وشیوعی وئاینی یان تیکەلیك لەوانە ، زۆربەی هەرە زۆری لە داهێنانی خۆیان نیە و هێنراون بێفلتەری ئاسایشی نەتەوەیی ، بۆیەش بە خێرایی لەگەل گۆڕنی نەخشەی دەولی ورۆلی ئەو مەدرەسەو ئایدیۆلۆجیانە ڕاستەوخۆ دەگۆڕێن کە نیشانەی چڕی پاشکۆیی حزبە کوردستانیەکانە ،ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ئایدیۆلۆجیا جیاجیایەی لە کوردستان هەیە بەو ماوە کورتە زۆربەی تاقم وحزبە کوردستانیان چەندین ئەوبەرو ئەوبەریان کردووە لە لاسایی کردنەوە، تاڕادەی پێچەوانە، بۆ زیاتر بڕوانە ئەو لیستەی بەراورد لە ماوەی 10 سالی کۆتایی سەدەی بیستەم لە خوارەوە تومارمان کردووە، بەووردی دەری دەخا کە ئەوانەی لاسایی کەرەوەن بەرهەمی فکری خۆیان نیە، بەدوای پێخوستی خەڵکی ترن لەدوورەوە، بۆیە گەلێ جار دەگەنە کۆلە ڕێ، گەلێ جاریش کارەسات، جاریش وایە ئەوەندەی ڕۆیشتووینە دەگەڕێینەوەو لەعنەت لەو ڕابوردووە دەکەن.

ئەوە هەموو خاڵە جیاوازیەکان نیە، تەنها ئەوانەیە کە پێچەوانەی هەڵوێستی خۆیان بوونەتەوە

| پێش ڕووخانی شیوعیەت– 1990 | دوای ڕووخانی شیوعیەت |
|---|---|
| 1– دژی دیموکراسی، مافی مرۆڤ، کۆمەڵگەی مەدەنی، ئازادی، | 1– زۆر جەخت لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مەدەنی و |

| هەڵبژاردن بوون بە ئاشکرا و لە نووسینەکانیاندا. | ئازادی و هەڵبژاردنن لە نووسین و ئاخافتندا. |
|---|---|
| 2- ئیسلام ئاینی میسالی یە و گەڕانەوە بوو بۆدواوە. | 2- بە گفتە بانگێشەی ئیسلامی دەکەن، نابێت لە سەنگەری کوردایەتی جیابێتەوە، زیاتر گۆتەیە نەك کردەوە. |
| 3- لایەنگری شیوعیەت، دیکتاتۆریەت، بەرەی ڕزگاری و سۆشیالیستی جیهانی بوون. | 3- دژی دیکتاتۆرین، دژی شیوعیەت و هەتا بەرەی ڕزگاریشن. |
| 4- نەتەوایەتی، رەسەنایەتی، بەهاو نەریت بە ڕەجعیەت حساب | 4- زیاد لەپێویست نەتەوەیین و کوردایەتی شەرەفە. |
| 5- لایەنگیری مافی گەلان بوون. | 5- تووتیانەدەیلێنەوەبە تیرۆر و نایاسایی باسیان دەکەن. |

هەمان لیستیش دەتوانرێ بۆ لایەنە ئیسلامیەکان بکرێ چۆن فۆرم وستراتیژیەتیان دەگۆڕن بە پێی گۆڕانی نەخشەی هێزو ئەزمونی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی دەرەوە بیداهێنان ، بە کورتی دەتوانین بڵێین جم وجۆلی سیاسی وئایدیۆلۆجی کوردستان بریتیە لە ڕەنگدانەوەی جم وجۆلی سیاسی بیانی ،ئەوەش پاشکۆیی پەتیە .

**دوەم لاسایی وپاشکۆیی حزب وتاقمە کوردیەکان لە ناوەکانیان** : سەرچاوەی زۆربەی حزبە کوردستانیەکانی بۆ (پ د ك)دەگەڕێتەوە کە سەروەری هەلگیرسێنەری شۆرشی ئەیلولی هەیە، ئەویش بۆ (هیوا)، هیواش بۆ(حزبی دارکەر) بە سەرۆکایەتی رفیق حلمی، با بزانین ناسنامەی ئەو

حزبه له کێ ساغ دەبتەوە؟ دارکەر کت ومت کۆپی (کاربۆناری ئیتالیایە)[251] کە(تورکیای لاو)ی لەچاوکرایەوە،دوایش (ئیتحادولتەرەقی) دژ بەکوردی لەتورکیا هێنا ئارایەوە، چ لەوە چەوت تر هەلسیت موعجیب بیت بە دوژمنت ولاسایی داگیرکەرت بکەیتەوە،چ لاساییەك ئەزمونی شکست خواردووی نیوان 1807-1830، لێرەدا دەبێ تەسلیمی ڕایەکەی ئیبن خەلدوون ببین کە دەلێت (بأن المغلوب مولع أبداً بالإقتداو بالغالب)[252].

بەکورتی لەسەر باقی حزبەکانی کوردستانی دەکەین لەسەر (ی ن ك) زیاتر دەوەستین چونکە ئەگەر کاریگەری ئەزمونی (پ د ك) لەسەر یان تۆخ بێت ئەوا لەقۆناغی نوێ ئەوەی (ی ن ك) زیاترە :

1- حزبی سوشیالیستی یەکگرتوو هەبوو لاسایی حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی ئەلمانیای 1919 بە سەرۆکایەتی روزا لوکسمبورگ ،دوای حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی فرنسی 1961دروست بوە.

1. حزبی زەحمەتکیش وکریکاران ورەنجدەران هەبوولە کوردستان لە ناوی(حزبی زەحمەتکیشانی ئەلبانی،کۆمەلەی ڕەنجدەرانی لاوس...) وەرگیراوە .
2. پاسۆك هەبوو لە کوردستان ناوەکەی لەحزبی سۆشیالیستو پاسۆك لە یۆنان وەرگیراوە.
3. پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان هەبوو ناوو ناوەڕۆکی لە پارتی کاری سەربەخۆی کۆریاوەرگیراوە بە سەرۆکایەتی کیم ئیل سونگ،
4. لە کوردستان ڕەوتی کۆمەنیست هەبوو ئەوەش لە ڕەوتی کۆمەنیستی ئیتالیاوەرگیراوە
5. پارتی گەل ودوای پارتی گەلی دیموکراسی هەبوو ئەوە لە پارتی گەلی ئەفغانستان وەرگیراوە کە لە 1946 دامەزراوەلە سالی 1920 (حزب الشعب السوری)یش هەبوە، پارتی گەلی تورکیاش هەبوولە سالی 1962 دروست بوو ،

---

[251]کاربوناری لە سالی 1807 لە ناپۆلی ئیتالیا بە مەبەستی یەکخستنەوەی هەمو ئیتالیا لەسەر بنەمای نەتەوایەتی ودامەزراندنی حکومەتیکی دەستوری دروست کراوە ،ماناشی دارکەرە(یان ڕەژووکەری)،دوای لە 1830 شکستی هیناو (ماتزینی)ئیتالیای لاوی لە 1831 لەجێی کاربۆناری دروست کرد.

[252] ابن خلدون –مقدمة تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر–القاهرة ص192 .

6. پارتی کریکارانی کوردستان(پ ك ك) کە سەروەری گەورەی هەلگیرسێنەری شۆڕش و بەرخودانی نویٚ لە کوردستانی باکوڕ بۆ ئەو دەگەڕێتەوە ، لە جیهانی شیوعی زۆر بلاوە پارتی کریکارانی بلجیکی لە1885 دروست بوە،پارتی کریکارانی مەجەری لە1918 دروست بوە، پارتی کریکارانی ڤیتنامی پارتی کریکارانی ئەلبانی ...زۆری تر .

7. تایبەت بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان :

زۆربەی حزبە کوردستانیەکانیش لاسایی کەرەوەی سیاسی و فکری و فەلسەفی و ئیداری .. ئەون بەچاك و خراپیەوە،بە داهینەر وپیشڕەو دێتە بەرچاو، کەچی ئەگەر زیاتر لێی وردبینەوە دەبینین(ی ن ك) لەپێش دا بە پاشکۆیی دروست بوە(لەو ڕوەوە)، با سەرنج بدەینە ناوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و پێکهاتەو ئەو تیۆرەی لەسەری دەڕۆیشت و وا لەسەری دەڕوا، وەك ئەزموونێکی نوێیە لە کوردستان، کەچی دەبینین ئەوەش کت و مت لاسایی کردنەوەی ناوو ناوەڕۆك و ئەزموونی هەندیٚ حزبی جیهانە، لەوانە:

أ- ئەزمون وناوی (یەکیتی نیشتمانی سودانی(سانو) کە لە 1958 دروست ببو بە سەرۆکایەتی جوزیف ئودوهو ،دروشمی دیموکراسی بۆ سودان وفیدرالی بۆ خواروو بوو .

ب- ئەزموونی( یەکێتی نیشتمانی ئەنگۆلی)کە لە سالی 1966 دروست بووە بە سەرۆکایەتی سافیمبی(لە دایك بووی 1934).

ت- ئەزموونی یەکێتی نیشتمانی زیمبابوی(زانو)کە لە (زابو) جیا بۆوە لە سالی 1961،لە سەرەتا ڕێبازێکی مارکسی ماویانەی هەبوو.

پ- ئەزموونی یەکێتی نیشتمانی کینی لە سالّی 1960 دروست بوو لە 3 بالّ (بزوتنەوەی سەربەخۆی کینیا، کۆمەلّەی هەلّبژاردە، هێلّی گشتی ئەفریقیا) ئەی ئەوە کت ومت و ناو و ناوەڕۆکی یەکێتی نیە کە پێکهاتبوو لە سیٚ بالّ (بزوتنەوە، کۆمەلّە، خەتی گشتی).

ج- ئەزموونی (اتحاد الوگنی عێراقی- یەکیتی نیشتمانی عیراقی)بەسەروکایەتی عبدالفتاح ابراهیم لە سالی 1946 وەك رەوتیکی مارکسی لەژیر پەردەی یەکیتی هیزە نیشتمانیەکانی نەتەوەگەری وبەعسی وشیوعی .

8. ناوی حزبە ئیسلامیەکان : ئەگەر چی ئەزمونی حزبە ئیسلامیەکان ساوایە کەچی ئەوانیش

له دەردی لاسایی و پاشکۆیی دەرنەچون،لاسایی ئەوان له ئەزمونی عەرەبی ،له کوردستان حزبی ئیسلامی بە ناوی نەهزەو (جماعە-کۆمەل) وبزوتنەوە ئەوناوانەش له نەهزەی تونس وتاجیکستان وەرگیراوه ،ئەوانەش له حزبی نەهزەی ئیسلامیان وەرگرتوه که له 1920 له شۆرشی بیست چالاك بوو،کۆمەل له کۆمەلی پاکستان وبزوتنەوە له بزوتنەوەی ئیسلامی فلستین و...لاسایی کردنەوەکه تا ڕادەی کەسێتیش بوە ، له ئاوازی گوفتەو دەنگ بلندی وگریان وپیکەنین وفەرهەنگەکانی تر ئەوان زیاتربە کەلتووری عرب کاریگەرن .

**سێیەم فەرهەنگ وڕاگەیانن** : هەلوەستەیەکیش له ناوی رۆژنامەکانی کوردستان بکەین بزانین چەندە لاسایی وپاشکۆیەتی بیانیه : رۆژنامەکانی کوردستان سودیان لەو ناوانە وەرگرتوە: ڕیا تازە — ئەرمینیا،ڕێگای گەل —کۆریا،تورکیای نویٚ،برایەتی-هندستان،خەبات-فلستین،ئالای ئازادی-لبنان،اتحاد-زبیان..با داهێنەر ترین حزب لەکوردستان له قەپانی لاسایی وپاشکریەتی بدەین ،بلاٚوکراوەکانی یەکێتیش هەمدیسان لاسایی بوو،(شرارە) یەکەم بلاوکراوەی بوو ئەوالاسایی ئەو شەرارەیە بووەکە(لینین)دەری دەکرد له سالی 1900بەناوی (ئایسکرا)، هەروەها ریکخراویکی ئەرمەنی بەناوی (یەکیتی قوتابیانی سوشیالیستی دیموکراسی هەشناقی)له سالی 1911دەری دەکردبە ناوی (غایدز- واتە- شرارە) .با کەمێك هەلوەستەله ڕۆژنامەی (یەکسانی)دەست پیٚ بکەین که لەلایەن کۆمەلٚە ئافرەتێکی عەلمانی چەپی له کوردستان له سالاٚنی دوای ڕاپەڕین دەردەچوو.. ئەوە کت و مت بەناو و ناوەڕۆك و مەبەستەوە، لاسایی کردنەوەی ڕۆژنامەیەکی ئەلمٚانی بوو بەناوی (گلایشخایت- واتە یەکسانی) لەسالی1891ز دەردەچوو، واتە پێش 104 سال لەمەوپیش، ئەویش کۆمەلێك ئافرەت بەڕێوەیان دەبرد، ئەو ئەزموونەی گلایخایت 25 سالٚی خایاند و شکستی هێنا.

**چوارەم پاشکۆیی ولاسایی مونەزیرە گەورەکان** : کۆمەلگەی کورد ڕاستەوخۆ لەو دەردە بەرپرسیار نیە، بەلکو مونەزیرەکانن، موفەکیر وسەرکردە گەورەکان لەگەل بلیمەتی و قارەمانیەتیان له کۆتایدا تووشی پاشکۆیەتی ولاسایی سەخت بووینەوە، مام جلال (کەدواپلەی گەیشتەسەرۆك کۆماری عیراق) گەورەترین مونەزیری ئەو سەردەمەیە له بەراوردی نیوان ئیسلام وسۆشیالیستی ڕای وایە کە سۆشیالیست بەهەشتی پێیە بۆ ئەو دنیایە ، هەرچی ئیسلامە دەلیٚ خۆ ڕاگرن بەهەشتان له

دوارۆژ پێ دەدەم [253]،ئەوە دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەڵێ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل في أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلي الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية في هذا العالم الدنيوي)[254]،ئەوە لەکاتێکایە کە ئەوەی ئەنجلس ڕاستە بۆ ئاینی مسیحی دەستکاری کراو نەك ئاینی ڕەسەنی مەسیحی ، لە بنەچەدا دروشمی شۆڕشی ئاینی تۆماس مونزیر بۆ رزکاری جوتیاران لە 1513 کەبریتی بوولە: وامەزانن تەنها ئاسودەیی بۆ رۆژی دواییە بەلکو ئاینەکەمان ئەو بەهەشتە بۆ دنیا دەهێنێ[255]، پاشکۆیەتیەئایدیۆلۆجیەکەی لەوە دێت کە مام جلال بۆچوونی خۆی ڕاستەوخۆ بێ لێپێچانەوە لە ئەنجلس وەرگرتوە ،ئینجا گشتاندیەتی بەسەر ئیسلام کە لەجەوهەردا لەگەل ئاینی ئیستای مسیحی لیك جیان ،هەمان بەراورد موفەکیری گەورەی کورد عبدالله ئۆجەلان دەیکا دەلێ: پیغمبەرو ئیمام علی لە ئیمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی مارکس وئەنجلس لە مانیفیستی شیوعی دەلین سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[256]، د جورج حناش کەدەلێ پیغمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە کایەوە[257].. لەوەوە زیاتر ئەو دەردە شۆڕ بوویتەوە بۆ خوارەوە، کتیبی (سەگوەڕ)کە لەسالی 1982 لەلایەن نوسەرێکی گەورەی کورد نوسرایتەوە و شۆڕشی کوردی بە (سەگوەڕ)شوبهانبوو .. لە بنەچەدا ئەوە کت ومت لە (بروتوکولات حكماء الصهيون) شۆرش بە سەگوەڕ واهاتوە:(ان الثورة ليس أكثر من نباح كلب على فيل، ففي الحكومة المنظمة تنظيماً حسناً من وجهة النظر الاجتماعية لا من وجهة النظر إلى بوليسها، ينبح الكلب على الفيلمن غير أن يحقق قدرته، وليس على الفيل الا ان يظهر قدرته بمثل واحد متقن حتى تكف الكلاب عن النباح، وتشرع في البصبصة بأذنابها عندما ترى الفيل)[258]،هەمو ئەوانە بریتیە لە پرۆسەیەك پێی دەووترێ لاسایی کردنەوە و پاشکۆیەتی .

---

[253] بڕوانە :دەقی ووتارەکەی مام جلال بە بۆنەی یەکگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك).

[254] مايكل لوفي – الماركسية والدين ، ترجمة : بشير السباعي ص3 .

[255] روجيه غارودی- ماركسية قرن عشرين ص150 .

*256 ماركس– انجلس بيان الشيوعي ص64 .*

[257] د جورج حنا- قصة الإنسان ص65 .

[258] بروتوكولات حكماء صهيون – بروتوكولرقم:19 .

*** *** *** ***

پاشکۆیەتی دەبێتە سەرچاوەی کۆمەڵێك دەردی تر کە چەمك وزاراوەی تایبەتی بۆ داتاشراوە ،ئەوەی لەڕەوتی بابەتەکەمان نزیکە هەریەکە لە (تقزم الثقافی) و (پیشڕەوایەتیە) کە ئەوەی دوای ڕێك پیچەوانەی پاشکۆیەتیە ، بۆیە هەریەکەیان بە چەمکی سەربەخۆو تایبەتی بایی ئەوەندە لەسەری دەوەستین کە پێویستە باقی زانیاریەکانی تر لەو چەمکە(پاشکۆیەتی ولاسایی)هەیە .

**<u>چارە لە پاشکۆییەوە بۆ پیشڕەویەوە</u>** : لە قورئان بەتوندی دژی وەستاوە (ولاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ) لەفەرمودەش: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْراً بِشِبْرٍ وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ)،**بەو شێوەیە ئاسانە ڕای گشتی بۆ ئەو پرسە دروست بکرێت .**

بەلام لەوپرسەش تووشی پاشکۆیی بوویتەوە ، مەرج نیە پاشکۆی ئابووری ببتە پاشکۆییەکانی تر ، لەو تێڕوانینە مارکسی وسەرمایەداری هاوڕان کە سەرچاوەی پاشکۆی ئابووریە دەردی هەمو دەردانە ،هەر لەویشەوە چارە دەست پێدەکات ، بۆ وەرچەرخان لە پاشکۆییەوە بۆ پیشڕەوایەتی چەمکیکی تایبەتیمان بۆ تەرخان کردوە لەو مەوسوعەیە .

(8)

| **تقزم الثقافى** | dwarfs Cultural | خۆبەبچووكزانی |
|---|---|---|

**چەمكەكانی (كارلیكی فەرهەنگی — پیكدادانی فەرهەنگی لاسایی**،صدمة الثقافية، **دونیه ، ناردۆ ،ناردۆنیست، خۆ بە بچوك زانین،** الانصهار الثقافي:cultural fusion، **دانەهێنان ، (پیچەوانەی پیشڕەوی)، ئینتلجنسی**،زیلۆتی وهیرۆدوی،**گۆردیما،** التمثل،ثقافة الذوبان، ملكەچی فەرهەنگی —Assimilation)، (التثاقفacculturation ...)**دەگرێتەوە**

ئەو چەمكە زۆر تایبەتە لە ئاویتە بوونی چەند چەمك وزاراوەی تر دێت ، بۆیەش یەك ووشەی كوردی وعربی ئامادە نەبوو گوزارش لەو چەمكە بكا ناچار زاراوەیەكی ئاویتەمان بۆ هەلبژاردوە (تقزم الثقافی)، لە بەیەك گەیشتنی دۆخێكی تایبەتی شارستانی و سایكۆلۆجی وفەرهەنگی دێت ، لە باری ئاسایی پیك گەیشتن و كارلیكی فەرهەنگەكان (الانصهار الثقافي:cultural fusion ) بەشێكن لە گەشەی هەردوولاو كۆمەلگەش ، زۆربەی شارەزایان لەو بارەیەوە پێیان وایە بەیەك گەیشتنی دوو فەرهەنگ دەبێتە هۆی دروست بوونی فەرهەنگی سێیەمی بالا ، نزیكە لە تیۆرە فلسفیەكەی هێگل كە بە (ثالوث هیكل- سێ كوچكەی هیگلی)ناوبانگە ، باوەری وابوە بۆ هەر پرۆسەیەك دژێكی بۆ پەیدا دەبێ ، لە ململانێی هەردوولا پێكهاتێكی بالاّ تر لەهەردووكی پێشوو سەر هەلّدەدا، یان بەگوزارشە دیالكتیكیەكە (بوون —دژ-پیكهاتەكی بالاتر)[221] الشيئ، ضده، مركب الأعلى- Theses -untiTheses- synTheses[260]، بەلای ئەوە نەچووینە كە كارلیكی دوولا نەبوە بەلكو

[221] جون لويز– مدخل الى الفلسفة دار الحقيقة بيروت،ترجمة:انور عبدالله،ط2 ص194

[260]مدخل الى الفلسفه – ص193 . هەرچەندە ئەو رێسایە بۆ هیكل دەگەریتەوە بەلام لە بنەچەدا واپیدەچی مولكی فارابی بێت، شلنگیش ئەو (ثالوث)ەی بەكار هێناوە، تەنانەت لینین دەلێ ئەو بۆچوونە فلسفیەزۆركۆنەیەكەم جار

هەللووشینی یەکەم بوە بۆ دوەم ، بۆیەش زۆر بەکەمی لەلایەن ئینسیکلۆبیدیاو قاموسەکان تۆمار کراوە ، چونکە لەلایەن فەرهەنگ و بۆچوونی میلەتانی سەردەستە مانای (تقزم الثقافی) نابەخشێت بەلکو کارلیککردنی فەرهەنگی وشارستانی وکلتوری دەبەخشێ ، بە ڕوانگەی ئەوان ئەوە یارمەتیە ، بیری (ئیستعمار) لەوەوە هات، لەلای ئەوان بەرگری لە (تقزم الثقافی) بە توندڕۆیی و بەرگری وتیکدەر ودژ بە زانست وشارستانی وەسف دەکەن ، لەوەوە لەلایەن زۆر زاناو مونەزیرو بیریاری وولاتانی جیهانی سێیەم بە ڕێنمایی تایبەت بەرگری لە بوونی خۆی کردوە ، لەو بارەیەوە غاندی ئاماژە بە مەترسی ئەو دەردەدەلێت ئامادەین دەرگاو پەنجەرەی هند بەسەر دونیا بکەینەوە بەلام ناهێلین لە ڕیشەوە دەرمان کێشن . زۆربەی لایەن وحزب دژایەتی ئەو دیاردە دەکەن تەنانەت هەندێ تەیاری عەلمانیش ، لەسەر ئاستی نێودەولەتیش بەلای ئەو بابەتە چووینەو یۆنسکۆ پاراستن ومافی ئەوانەی لە ئەستۆ گرتوە ،لەوانەش مادە 4(1) و 4(3) (اتفاقیة الیونسکو المتعلقة بحمایة وتعزیز تنوع أشكال التعبير الثقافي، 2005) -هەروەها (وتنص اتفاقية منظمة العمل الدولية رقم 169 بشأن الشعوب الأصلية والقبلية في البلدان المستقلة، لسنة 1989، على ضرورة أن تعزز الدول التحقيق التام للحقوق الاجتماعية والاقتصادية والثقافية لهذه الشعوب فيما يتعلق بهويتها الاجتماعية والثقافية، وبعاداتها وتقاليدها ومؤسساتها)[261]. بەوپێناسەش دەستی پێکردوە : الجماعة الثقافية: وحدة اجتماعية شديدة التماسك يحس أفرادها بشعور قوي بالوحدة والتضامن وتميَّز عن غيرها من الجماعات بثقافتها أو معالمها الثقافية أو بعنصر مغاير للثقافة الوراثية[262].

<u>**چەمك وزاراوە هاوتاكانی تەقەزوم:**</u> وەك لەسەروو باسمان کرد ئەو چەمکە کەمتر باسی لێوە کراوە بۆیەش پیناسیکی وای بۆ نەکراوە ،کە دەتوانین بلێین کۆمەلە پرۆسەیەکی ئالۆزی سایکۆلۆجیە تووشی تاك وکۆمەل دەبێت وادێتە بەرچاوت کەخۆت وفەرهەنگ وتواناوچارەت بچوك ولاوازە هی

---

لەسەردەستی ئەگریکیەکان هاتوە، لینین –المختارات –ج1 ص529–530 . ، (فارابی) بەو شێوەیەی گوزارش کردوە (المادة –الصورة –المرکب من المادة والصورة فارابی– اراء اهل المدینة الفاضلة ص65)

[261] اتفاقية منظمة العمل الدولية رقم 169 بشأن الشعوب الأصلية والقبلية في البلدان المستقلة، 1989، المادە 2(2)(ب).

[262] مشروع مسرد اقترحه فريق من الخبراو فی مکتب لجنه هولندا الوگنیه للیونسکو، TER/CH/2002/WD/4، 2002.

خەلکیش گەورەن ، ئەگەر پیناسی زۆری نەبیٚ ئەوا بۆ زیاتر تیٚگەیشتن لەو چەمکە هەول دەدەین ڕاڤەی چەمك وزاراوە هاوتاکانی بکەین ،کە بریتین لە (بیٚوورە —انهزامی ،دونیە،ئەیتیما ،...) .

1-لە زاراوەی ( انهزامية) دەست پیٚدەکەین ،ئەو زاراوەیە لە جەنگی جیهانی دوەم سەری هەلدا ، دەردیکە تووشی دەولەت ومیلەت وهیٚزە بیٚوورەکان دەبیٚت لەکاتی ململانیٚ وجەنگدا ،بەواتای لاوازی گیانی بەرگری وهەردەم واتیٚبگەی کە شکست دەهیٚنی ،ئەو هەنگاوە دەروازەی خۆبەدەستەوەدان بەرگری نەکردنە ، ئەو زاراوە هەر لە مەیدانی جەنگی قەتیس نەماوە بەلکو لە کاتی بەیەکگەیشتنی شارستانی وفەرهەنگی و کەلتوریش هەمان ئەنجام دەدا ، وادەکا زۆر کەم ئیعتماد بکەیتە سەر خۆت ولەکۆتاییدا لە ماناو جەوهەری (تەقەزوم)ت نزیك دەکاتەوە .

2-زاراوەی( دونیە-inferiority )ئەویش ئەو تەقەلایە کە ئیستعماردەیدا بۆ موستەعمەرە تا وای تیبگەیەنی ئەو لاوازەو ناتوانی گەشە بەخۆی بداو دەولەتی پی دروست نابیت[263] ،مقەوەماتی گەشەی نیە ، لە قاموسە زمانەوانیەکان (دونیە)بە مانای خۆ بەبچوك **زانی ،بەدەقەعربیەکەی** (دونية:خِسَّةودناءة عُقدة الدُّونيّة)، لە ڕووی سایکۆلۆجیەوە : الشعور العميق والمستمرّ عند الفرد بدونيّته وعدم كفايته وانحطاط قدره ، وهي عقدة نفسيّة تنشأ عن الصّراع بين النُّزوع إلى التميُّز ، والخوف من التثبيط الذي كان الفرد قد عاناه في الماضي وفي حالات مماثلة[264].

هەرچی موسوعە بریتانی(Encyclopædia Britannica) (دونیەinferiority )ی داوەتە پال هەمو ئەوانەی لە خوار تیکڕای ناوەندین لە فەرهەنگ و سیستەم وکەلتور ودەبیٚتە جۆرە شەرمیك بەرامبەر ئەوانەی لەسەرووی ئەون[265] ، جاریش وایە دەلیٚن ئەو دۆخە دابەشیٚکی خواییو وبەختە،بەختی ئەوانە ڕەشە ، دەیان ووت ئیوە بۆ خزمەت وشوانی وجوتیاری دروست بووینە ،ئەوە رەگی بۆ ڕایەکانی دەگەڕیٚتەوە، ئەرستۆ لەکتیٚبی(رساله السياسه-پۆلیتیك) بەندایەتی گیٚڕاوەتەوە بۆ

263 الموسوعة الميسرة للمصطلحاتالسياسية ص210..

264 معجم المعاني الجامع - معجم عربي عربي- المادة:دونية .

265 Encyclopædia Britannica- Article :inferiority

بڕیارێکی خوایی نەك کۆمەڵایەتی، دەڵێ ئەوانەی عەقلیان کەمە کار بە جەستەیان زیاتر دەکەن، ئەوانەن خوا لە بنەڕەتدا ئیجباری کردوون بۆ بەندایەتی و کڕین و فرۆشتن! لەسەر ئەو بنچینەیە دابەشیەکی ئەزەلی چینایەتی لە کۆمەڵگە دروست دەکا، دەیان ووت هەموو مرۆڤ لە قوڕە، بەڵام چینی ئۆرستوکرات ودەسەڵات قوڕەکەیان لەلای خودا زیادەی زیوی تێکراوە ، هەرچی جوتیارو چینەکانی تری خواروو قوڕەکەیان بە مس وئاسن تێکەڵاوکرابوو، لە بنەچەدا خوا بەشەرەکانی وەك دەمی شانە دروست نەکردوە [266]، تا ڕادەیەك (فارابی)یش کاریگەرە بەڕایە چەوتە ولە (مدینة الفاضلة)ی لەسەر ئەو بنچینە ڕێکخستوە [267]، تۆینبی لە (مختصر دراسه التأریخ) دەڵێ کۆمەل وەك لەشی ئادەمیزاد فەرمانبەرو فەرمانپیکراو، ماندوو وحەساوە، گرنگ وناگرنگ، لەپرۆتۆکۆلەکانی زایۆنیش واهاتوە(أنه لا مساواة في الطبيعة، وأن الطبيعة قد خلقت أنماطاً غير متساوية في العقل والشخصية والأخلاق والطاقة)[268]، بەشێك لە فەیلەسوفەکان وەك (دی گۆبینو)[269]، (شامپرلین)، (بەواس)، (فیشەر)(ئەرنست رینان).. بەجۆرێکی تروای بۆچووبوون .

3-زاراوەی ( international caltivation analisis-) بە مانای تەقەلای ئیستعماری سەقافی بۆزال بوون بەسەر فەرهەنگی تر و داگیرکراو ،**ترجمەکە ی لەلایەن** (الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية )بە هەلە (تحليل انماوالدولی) [270] بۆ داناوە ،بەلکو (تحليل ثقافی دولی ) تەواوە .

4- ئەیتیما(atima) زاراوەیەکە بەو میلەتانە ووتراوە کە مقەوەماتی مانەوەیان لاوازەبە هۆی باری کۆمەلایەتی وسیاسیو شارستانی وفەرهەنگی [271]،جاروایە ئەیتیما بەو دەولەتانە ووتراوە کە پیگەیان لە نیو دەولەتان لاوازە-تەقەزومی دەولەت [272].

---

[266] بڕوانە :جمهورية افلاتون ص76 هەروەها بڕوانە:مدخل الى الفلسفة ص64

[267] فارابی – اراء اهل المدينة الفاضلة ص66

[268] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980 بروتوكول رقم:1.

[269] ئەرسەر دی گۆبینۆ1816- 1882 لەکتێبێکی بە ناوی (مقال عن عدم المساوات بين الاجناس البشريه) دەڵێت توانای بیرکردنەوەی هەموو میلەتیك وەك یەك نیە بۆیە تەنها میلەتی ئاری شایستەی ئەو سەرکردایەتیە، ئیتر ئەو تیۆ روانینە کۆمەڵێك تیۆری سیاسی رەگەزایەتی ترسناکی لێ پەیدابوو. یەهوودی وعەرەبی شۆڤینیش تا ڕاددەیەك ئەو پاگندەیە دەکەن.

[270] الموسوعة الميسرة للمصطلحاتالسياسية ص93

[271] **الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص19**

5-(ارض لاصاحب لها- res nnullius)بەو ناوچانە دەووترا ئیستعماری دەچویٚ بیخاوەن بوو ...

6-زاراوەی (ئینتداب)  لەو فلسفە هاتوەکە میلەتانیك لاوازن ناکەونە سەرپیٚ بیٚیارمەتی دەرەکی ،بنەمای ملتۆن کە دەلیٚ :(لا تدع بريطانيا تنسى رسالتها في تعليم الأمم كيف تعيش)[273] ،واتە  ئەو میلەتانەی ژیٚر ئینتداب وەك قوتابی وئەوانیش مامۆستا بۆ فیرکردنی ژیانی دەولەتداری ،  لە ڕاستیدا سیستەمی ئینتداب جیا بوو لە بنەماکانی مافی چارەنوس کە لە جامعەی ئیسلامی، لە 14 بنامایەکەی ویلسون ولە جارنامە هاوبەشەکەی فرنسی وبریتانی هاتبوو ،بەلام  دوای بە یاسایی کرا لە پەرەگرافی (4) ودیباجەی ماددەی (22)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان وەسفیان دەکات و دەڵیٚت: میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فیٚری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەولەت، لەوەش دابەشیەکی تر هەبوو بەپیٚی فەرهەنگی داگیرکەر، سیٚ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو پیتی سی هەرە خراپەکەی بوو .

7-لەلای هەندیٚ فەرهەنگی تر زاراوەی (التثاقفacculturation  - فەرهەنگی تیٚپەستان) لە قاموسە دەستوریەکان و لەموسوعەی عربی بە مانای بە فەرهەنگ کردنە ،یەکەم زانا کە ئەو زاراوەی بەکارهیٚنا (پاول) بوو لەسالی 1880[274]،  دەلیٚن ئەوانەن کە زیاتر نەریت وبەهاو فەرهەنگی کۆمەلیکی تر دەگرنە بەر چ هەموی یان بەشیکی[275] .

8- زاراوەی هەست بە نوقستانی (شەرمی فەرهەنگی) وەك لە مەوسوعەی بریتانی( Encyclopedia Britannica ) دەلیٚت هەستیکی  ئۆتۆماتیکیە(لا ارادیە) کە وا لە تاك دەکات وا هەست بکات فەرهەنگ ونەریت وکلتورەکەی لاوازە بەبەراورد لەگەل  بەرامبەرەکەی،  زانای دەرونی (ئەدلەر)پیٚی وایە ئەو جۆرە هەستە دەگاتە پرۆسە فسیۆلۆجیەکانیش ئەوەندە کاریگەریەکەی قوولە [276].

---

[272] بۆ زیاتر بڕوانە : معجم مصطلحات عصرعولمة  ص23

[273] د علي الوردي – لمحات اجتماعية.. ج5- ص56

[274] .موسوعة ا لعربية ج17ص740  .

[275] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدوليية ص81.

[276] Encyclopædia Britannica- Article :inferiority

9- له مەوسوعەی( The oxford dictionary of sosciology ) زاراوەی (التمثل— ملکەچی فەرهەنگی—Assimilation)بەکارهێناوە بەو مانایەی لەکاتی بەیەکگەیشتنی دوو فەرهەنگی (زال وملکەچ - ثقافة الذوبان)، رۆبیرت پارك بە (راهاتن وخۆگونجان)ی گوزارش کردوە[277].

10- تۆینبی هەندێ زاراوەی تایبەتی بۆ ئەو دۆخە فەرهەنگیە بەکارهینا لەوانە (زیلۆتی وهیرۆدوی)،یەکەمیان بریتیە لەبەکارهێنانی دابڕان وجاروایە بەرگری جۆربەجۆرەکان هەتا چەکداریش دژ بە زالی فەرهەنگی بەرامبەر نمونەش بە وەهابیەتی عربی وفەرهەنگی ئەوروپیش دەکا و بە کاریکی ناعقلانی وەسف دەکا ،هەرچی هیرۆدوییە ئەوانە عەقلانین بەرامبەر فەرهەنگی زال وبەرگری ودابڕان وهەلاتن ناکەن بەلکو پرۆسەکە دەکەنە کارلیکی یەکلایەنەو زیاتر فەرهەنگە زالەکە وەردەگرن ..نمونەش بە محمد علی پاشاو کمال ئەتاتورك دەهێنیتەوە .

11- لە ئەفریقا ناویکی ترهاتبوو بەناوی (گۆردیما)کە لە رۆمانیکیان هاتبوو ،گوزارشی لە ژیانی گوندی ناسنامە ڕەسەنی ئەفریقی دەکرد ،کەچی کە شاری دەبوون ناچار لە فەرهەنگ وشارستانی رۆژئاوایی دەتوانەوە[278] ،هۆیەکەشی ئەوەیە مادام نمونەیەکی ئامادەی شارستانی وفەرهەنگی شاریت نەبێت ئاوات بەسەردێت ،لەوەوە خاوەنی رۆمان دەچیتەوە گوند بۆئەوەی ناسنامەو فەرهەنگی نەتویتەوە .

12- لە (قاموس حزب البعث) لە مەیدانی سیاسی بە (افکار المضادة)ی گوزارش کردوە، پێی وایە هەریەکە لە (کۆمەلەوحزبی بیردەرەکی —گەلالە ئابوریە برجوازیەکان- فەرهەنگ ونەریتی دەرەکی —دژایەتی کەلتوری عربی) ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر دروست دەکا ، لە شوێنیکی تر لە بابەتی (اصالە) گوزارشی کردوەو دەلێ :شۆڕش وحزب ونەریتی ڕەسەن تەنها لە پیویستیەکانی میلەتەکەی

---

[277] موسوعە العلم الاجتماع ج1 المادە: التمپل

[278] بۆ ئەو سەربردەیە بڕوانە :مایکل ریبون —النارالسوداء حرب العصابات فی رودیسیا ص117

دیاری دەکات[279]، ...ناوی لە کارلیکردن کردوە (استنساخ) ، ئەوە لە ڕوانگەیەکی زۆر داخراوەو زیادەڕەوی تێدایە ...فەرهەنگ وکەلتوورو نەریت کارلیککردنی ئیجابیشیان هەیە .

بەشیکی تر دەیگێڕنەوە بۆ ئەو کولتورەی سەردەمی قۆناغی بەندایەتی ، ئەو پەیوەندیە نابەرابەریەی لە نێوان فەرهەنگی (بەندەو کۆیلە) لەلایەك وفەرهەنگی خانەدانان ،دوایش لە نێوان فەرهەنگی پرۆلیتاریاو فەرهەنگی برجوازی لە روانگەی مارکسی ، لە ئیستاشدا گوزارش بوە لە پەیوەندی نابەرابەری مرۆڤی رۆژئاواو مرۆڤی عەرەبی ئیسلامی .

بەڕای(هانا ئەرنت)لە کتیبی(ازمة الثقافة) هەندێ زاراوە هەیە سەرچاوەی دڕدۆنگی فەرهەنگی وبوونی کەمایەتی وزۆرایەتی وپیکدادانی فەرهەنگیە ،لەوانە:رۆژئاوا-ئیسلام-ئاسیایی-یهودی-مسیحی-دیموکراتی—دەولەت یاسا-دیکتاتۆری-تۆتالیتاری-تیرۆر-کۆمەلگەی دەولی —بازاڕی ئازاد- ..دەلێ بێماناشن لە بەکارهینان لای بەرامبەر وەڕس دەکا[280].

ماوە بلێین لە هەندێ دام ودەزگای نێودەولەتی ونەتەوە یەککگرتوەکان گرنگی بەو بابەتە دراوەو ڕێکەوتن وبڕیاڕی مافی بۆ دەرچوە ، زاراوەی جیاجیای بۆ دیاری کراوە ،وەك: (التنوع الثقافي) و (أشكال التعبير ) الثقافي) و( التراث الثقافي)و ( الهوية الثقافية) و( الملكية الثقافية)[281].

**ڕیشەی ئاینی وئایدیۆلۆجیەکانی :** ئەگەر چی لەزۆربەی کتیبە ئاسمانیەکان ئایەت وئاماژەی ئاشکرای تێدایە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەودۆخە فەرهەنگیە دووچاری تاك وکۆ دەبێتەوە ، بەدەیان ئایەت لە قورئان هەیە ،لە کتیبی پیرۆزیشئەو ئایەتە بەدی دەکرێت:(انقذ المظلوم من يد الظالم، ولا تكن صغير النفس في القضاء-سيراخ 4: 9)،بۆیە وەك سروشتی میلەتان ئامادەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ، لە (E.stanford) هاتوە خوان کارلوس(1493-1504)ی ئیسپانی بە توندی نارەزایی دژی ئەوسای دابەشی جیهان لە نێوان (خۆ بەبچووك زانین -تقزم) و (خۆ بەگەورە زانین) دەربڕیوە ،دەلیت هەمو بەشەریەت وەك یەکین ،هیچ میلەتیك لە میلەتی تر زیرەك تر نەکراوە

---

[279] تعريفات ببعض المصطلحات —مكتب الثقافة والاعلام ص21 ، ص56 .

[280] تاريخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص33 .

[281] UNESCO Thesaurus, http://www.vocabularyserver.com/unesco/atema=2563.

لەلایەن خواوە ،جاران ڕۆمیەکان وگەلی یۆنان دژی دروشمی ئاینی (هەموو مرۆڤەکان وەك دەمی شانەن) وەستانەوە،خۆیان بە زیرەك تردەزانی تا ئەو ڕادەیەهەریەکەلە ئەفلاتون وئەرستۆ باسیان لەوە کردوە کەهەموو مرۆڤ لە قوڕن بەڵام قوڕەکەی گەلی یۆنان زێڕیشی لەگەڵ بوە ، ئەرسەر دی گۆپینۆ1816- 1882 لەکتێبێکی بە ناوی (مقال عن عدم المساوات بين الاجناس البشريه )دەلیت هەموومیللەتیك لە زیرەکی وەك یەك نین، (شامپرلین)، (بەواس)، (فیشەر)..لایەنگری ئەو بۆچوونەن،بۆیە دەڵێن تەنها میللەتی ئاری شایستەی ئەو سەرکردایەتیەو میلەتی پیشڕەو سەردەستە بێت، میلەتانی تریش شایستەی بچوکی (تقزم)ن، ئەفریقیەکانیش ووتویانە خوالە ئێمەیەو ڕەشە،چینیەکان ووتویانە زەردەو لە ئیمەیە بۆیە ئیمە میللەتی خۆشەویستی خوایین وئاقل ترین،..لەگەل زۆر جۆرە پاگندەی تر ، یەهودیەکانیش دەڵێن ئێمە (شعب الله المختار)ین، لە( ثروتوکولات حکماء صهیون)- هاتووە: ((وقد منحنا الله العبقريه كي نكون قادرين على القيام بقياده العالم ))[282]، ڕایەکی بلاو هەبوو لەکۆنەوە گوایە (پیاوی ئاینی وقەشەکان)دەبێت لەنەوەی سام بن ،سوارچاکەکانیش لەنەوەی یافپ،هەژاریش لەنەوەی حام ..(گوایە لەبنەچەدا لەعنەت لە حام کراوە )دەلێن ئەوە کۆنترین دابەشی ڕەگەزپەرستیە لەسەر بنچینەی ئاینی، هەرچەندە عرب و عیبری یەك توخمن وسامین ،هەردوولایان بانگیشەی (ئەفزەلیەت)دەکەن ،کەچی یەهودیەکان لەو ئەسلەش پاساویکی دۆزیوەتەوە تا بەسەر عەرەبیش بالا تربن ،هەروەك لە (سفرالتكوين- 1:23-20 )ئەواهاتوە : ح ابراهیم لەکاتی مردنی سارای خیزانی پارچە زەویەکی لەزیفەی غربی ئیستای فلستین کڕیوە بۆ ناشتنی ،لە پیاویکی کڕیە بە ناوی عەفرۆن بایی 400میسقال زیو ،دوای ئەوەی ئیسرائیل دروست بوو یەکسەر مستەوتنیکیان لەسەر ئەو شوینە دروست کرد بەو بیانۆیەی ئەوان میراتگری ڕاستەقینەی مالی ح ابراهیمن ،چونکە: عەرەب لە نەوەی ئیسماعیلن کە دایکیان هاجەرە کەنێزە بوە کەچی یەهودیەکان لە سارانە کە ئازاد بوە نەك کەنیزە ، وەك داود ئۆغلۆ دەلێ زیاتر لە 2500سالە یەهودی بەو جۆرە لیکدانەوە شازانە کاردەکەن، بەو هۆیەوە مسیحیەکان بەگشتی واتیگەیشتون کە یەهودیەکان (ح مسیح)یان کوشتوە ،واتە خوداوەندی ئەوانیان کوشتوە ،هەریەهودیەکی ببینن بە

---

[282] بروتوكولات حكماء صهيون—برۆتۆكۆل رقم: 5 .

بكوژەکەی دەزانن بۆیە (اللاسامیە دروست بوو)[283] لە سالی 1197ەوە لاتیرانی سێیەم بڕیاڕی دەرکرد هەرمەسیحیەك تیکەلی یەهودی بیت لە کنیسە بیبەش دەکریت .بۆیە نەیانتوانی لەگوندان بژین .. ناسنامەیەکی تایبەتی خۆیان هەبیت ، وەك (ئەرسەرکۆستلەر)دەلێت.بوویتە هۆی جۆرە سایکۆلۆجیەیەکی شاراوەو دوودیو ,لەلایەك خۆبەگەورە زانین لەناخاو هەست بە کەمسەیرکردنی خەلکی تر .

لەناو عەرەبیش ئەو تەقەلایە هەیە وپێیان وایە میلەتی عرب زیرەکترن و میلەتی سەردەستەن ومیلەتانی تریش دەبیّ لە چاو عرب (تقزم)بن ،وەك پەیوەندی (ناردۆ) و (ناردۆ نیست) بن کە دوو زاراوەن لە دەستوری یۆگوسلافیا لەسالانی 1945 ، بە مانای (ناردۆ) میلەتە گەورەکەی دەسەلات وەك سرب لە یۆگوسلافیاو روس لە یەکیتی سۆفیەت ..ناردۆنیست نەتەوەکانی ترن وەك ئەلبان وبۆستی لە یۆگوسلافیاو باقی نەتەوەکانی تر لە سۆفیەت وزۆر شوینی تر[284] ، ئەوانەی پێشیان وابوە عرب فەزلی بەسەر میلەتانی ترنیە بە(شعوبی) ناوزەد کراون، ئیبن تەیمیە زیاتر ڕەتیدەداو بەوانە دەلیت گێل(احمق) کە پێیان وایە عرب لە هەمو میلەتیکی تر زیرەك تر نەبێت[285] ،هەروەها دەلێت:

(... كما أن جنس العرب يستحق من المحبه والموالاه ما لا يستحق سائر اجناس بنى ادم..)[286]

گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرموودە)ی وەك (حب العرب ايمان)، (العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)، ئەو ڕایە بوێری بە (شبلی عیسمی)داوە بلێ: (أحياناً العروبه أوسع من الإسلام)[287]..، بەلاّم هەریەکە لە (ڕاتزل) لە کتێبی (حضارة تقليدية) و (باستیان) لە کتێبی (وحده النفس) بۆچوونێکی وەك بۆچوونی ئاینی ڕەسەن سەلماندوویەتی کە کەس لەکەس عاقلتر

---

[283] احمد داوداوغلو – العمق الستراتيجى (موقع تركيا ودورها فى الساحة الدولية )ص414 ص421

[284] معهد السلام الامريكى (حل النزاعات بين الاديان) –مركز التعليم والتدريب-2008 ص 99

[285] شيخ الاسلام ابن تيمية – درء التعارض..ج3ص37

[286] منهاج السنة النبوية ج4ص276

[287] العلمانية والدولة الدينية ص213 .

نیەومیلەتیك لە میلەتیکی تر بالاترو موفەزەل ترنیە ، خوای گەورە بە یەکسانی پیداون کەسی تەقەزوم نەکردوە ، توانای ئەقڵی ئادەمیزاد یەکسانە با ڕەگەزیشی جیا بێ، ئەوانەی سەروو بۆچونێکی ڕەگەزپەرستی لێ دەفامرێتەوە، لەو سەردەمە ئەوروپا بەبێدەنگی لە ناخیدا خۆی پێبەرزترە لە بوارەکانی (فکر) و (خۆبەزلزانی) (سەرشارستانی) و (خۆ بە پێشەوا زانین)* ، بۆیەش کەمتر بازاڕی ئەو چەمکە هەیە ، پێیان وانیە ئەو دۆخەی ئیستای پەیوەندی فەرهەنگی ئەوروپی (رۆژئاوایی) ورۆژهەلاتی یان ووردتر لەگەل جیهانی سێیەم پەیوەندیەکی نابەرامبەریە، بریتیە لە پەیوەندی (بالایی فەرهەنگی ) و(بچوکی فەرهەنگی – تقزم الثقافی) هەر بۆیەش ئەو چەمکە لای ئێمە مانای هەیە لای ئەوان کەمتر جێی لە ئینسیکلۆبیدیاو قاموس وتویژینەوەکان دەبێتەوە ، وەك بەرجەستەیەکی ڕاستەقینەی دۆخی (تقزم)ی خۆمان ئێمەش لە جیهانی سێیەم لاسایی ئەوانمان کردوەو ئەو چەمکەمان لە قاموسەکان تۆمار نەکردوە ، بۆیە رەنگە (سلامە موسا)ڕاست بکا کە دەلێ : منم یەکەم کەس ئەو چەمکەم بەکارهێنابێت .

لەباری ئاساییدا بەیەك گەیشتنی دوو فەرهەنگ دەبێتە کارلیککردنی فەرهەنگی و فەرهەنگی سێیەم وەبەرهەم دێنێ ،ئەوەیان نەرێنی نیە ،لەو کاتە دەرگاو پەنجەرەی خۆت بۆ دەرەوە بکەوە وەك غاندی ووتەنی ، بەلام لەبارودۆخی نابەرابەر بەیەك گەیشتنی دوو فەرهەنگی نابەرابەر بەرەو (تقزم الثقافي)ت دەبا ،یارمەتی نیە بەلکو بەشیکە لە شکستی دەروونی وشارستانی وفەرهەنگی میلەتیك بەرامبەر میلەتانی تر ، دۆخیکی نا ئاسایی قۆناغی دواکەوتنی هەندێ لە میلەتانە ،بەدەگمەن لەنێو گەلانی جیهانی تر نمونەی وا هەبێ، ئەو دۆخە بە چەند قۆناغێك تێدەپەڕێ ، لە شکستێکەوە(جا ئەو شکستە سەربازیە یان کۆمەلایەتیە یان میژوویی و کەلتووری ..) بەرەو

---

*هەر لەو چوارچێوەدا هەولی داوە مێژووی زانیاری بۆ خۆی پاوەن بکا، بۆیە ناوی لە زانایانی کۆنی خۆی ناوە باوکی زانست وەك:هیرۆدتس- باوکی مێژوو، ئەبیکرات- باوکی پزیشکی، سیۆکریتشس –باوکی هونەر،هیرکلیتس- باوکی دیالکتیك، ستراپۆ- باوکی جوگرافیا، بیتلیمۆس –باوکی گەردووناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش –باوکی کۆمەلێك لقی زانستی تریان پێ بەخشراوە...کەچی لەپێش ئەوانە باس لەو بابەتانە کراوە،هەمووی ئەوباوکە نینە.

دواکەوتەو بەرەو لاساییەوە ئینجابەرەو پاشکۆییەکی خەستت دەبا،لە قورئان بەتوندی دژی وەستاوە ( ولاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ) لەفەرمودەش: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْراً بِشِبْرٍ وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ) ، تا وات لێدێت ئەوەی لای خۆت ومیلەتەکەتە لە میژوو وفەرهەنگ وکەلتوورو دام ودەزگای سیاسی و ئاینی وکۆمەلایەتی لات بچوك وبیکاریگەریە ،لەهەمان کات هەمان هاوتاکانی بیگانەت لا گەورەو کاریگەرە ، تا ئەو ڕادەیە شەرم دەکەی ئینتمای ئەو میلەتەت هەیە ،لەوەلامی پرسیاری تۆ کێی بەدەنگێکی نا پالاو شەرمنانە وەلام دەدەیەوە ، لەو کاتە بەیەك گەیشتنی هەردوو فەرهەنگی میلەتەکەت وفەرهەنگی میلەتە زالەکە کە بەیەك دەگا جۆرە کارلێکیکی یەك سایدانە دەکا لە چوارچێوەی یاسایەکی ئیبن خەلدوونی(بأن المغلوب مولع أبداً بالأقتداء بالغالب)[288]دەبێتە پیکدادانی فەرهەنگی (صدمة الثقافية)-ئەو سەدمەیە وەك قەیرانی فەرهەنگی ودەروونی دەردەکەوێ کاتێ بە فەرهەنگیکی تری بالاتر دەگەیت ،پیشی دەووترێ (culture shock)[289]، بەخیرایی توانەوەی فەرهەنگی (انصهار الثقافي) میلەتە لاوازەکە ڕوودەدا، سۆسیۆلۆجی ئینگلیزی(ئالیوت) ناوی نا فەرهەنگی داگیرکاری بالا و فەرهەنگی داگیرکراوی نزم ، لێرەدا هەر جۆرە بەردەوامیەکی کارلیکی فەرهەنگی وکلتوری وشارستانی لە چوارچێوەی (تقزم) بوون ڕوودەدا ، بەهەمان شێوە لەلای فکرو دەروونەوە چەند قۆناغێکی تری (تقزمی) دەبڕێت: (تقزم العلمی)، (تقزم الفکری)، (تقزم السیاسی)، (تقزم الحضاري). بەرە بەرە لەگەل تەوەرەکەی تری (تقزم) بەیەك دەگەن ودەگاتە بارە هەرە کاریگەریەکەی لەکۆتاییدا دەردی (تقزم الثقافي) لیێ بەرهەم دێت ،کە بارە هەرە خراپەکەی پاشکۆییە، لە (فەرهەنگی دەروونی سیاسی بالا) پیێی دەوترێ (تقزم الثقافي) ، لەگەل سەرهەلدانی سیستەمی ئیستعماری و دۆزینەوەی کیشوەرەکانی تر ئەو چەمکە زەق تر سەری هەلدا ، بوە هۆی توانەوەی چەندین میلەت بەو هۆیەوە .

دەبێ هەلوەستەیەکی گەورە لێرە بکرێت لە بارەی زنجیرەی دروست بوونی (تەقەزوم سەقافی) ئەو زنجیرەیە ڕێسایەکی گشتیە بەلام یاسا نیە ،بە پیچەوانەی ئەو ڕێسایە دەبینین ئەوانەی هاتوونە

---

[288] ابن خلدون –مقدمة تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر–القاهرة ص192 .

[289] معجم مصطلحات عصر العولمة ص295

جیهانی ئیسلامی وەك داگیرکەر ولایەنی زالیش کەچی دوای ئەوان تووشی تەقەزوم بووینەوەو توانینەوە ،لەوانە مەغۆل و هەندێ مەملوك وتورك وزۆری تر.

**هۆکارومیکانیزمی تەقەزوم(کوردوەك نمونە)** :ئەوەش کۆمەڵێك هۆ و پاساوی خۆی هەیە، گرنگ ترینیان ئەوەیە میلەتان تووشی جۆرەکانی داگیرکاریەکی سەربازی و فکری و کلتوری دەبون، بە تایبەتی لە سەدەی ڕابووردوو پیش زەق بوونەوەی عەولەمە ،ئەوکاتی ئەو جۆرە میلەتانە لە جیهان دادەبڕان ،دەبوو بە عەینەکی داگیر کەر دنیا ببینی ،بە بیری ئەویش بیربکەیەوە، وەك ئەوەی تووشی زۆر لە میلەتانی جیهانی سێیەم هات بەرامبەر جیهانی یەکەم ودوەم و هەڵمەتە داگیرکاریەکانیان،هەندێ جار میلەتانی داگیرکراو بەرامبەر داگیرکەری خۆجێیش ڕووی دەدا ، ئەفریقا بەرامبەر ئەوروپا ،هەندێ میلەت وکەمایەتی بچووك بەرامبەر میلەت وپیکهاتەی گەورەتر، لەو قوولاییەوە هاوپەیمانیەکی ئاینی وئیستعماری بە ئۆتۆماتیکی دروست بوە ، لە داگیرکردن ودۆزینەوەو چوونیان بۆ ناو میلەتانی تازە دۆزراوە لەوێ ئیستعمارو تەبشیری مسیحی ریك بوون لەقازانجی هەردوو لابوو ،هاندانی پاپاو پیاوانی ئاینی بەردەوام بوو ..لەو بارەیەوە بە ووردی(جان ثۆل- المستكشفون فی القرون الوسطی) سترنج بدة .

لەسەر ئەو بنچینەیە دروشم وتەقەلایەکی زۆری پیچەوانە بەدی دەکرێت بەتایبەتی لە ئەفریقا ،هەندیکی ئەرینی وهەندیکی پەڕەگرو نەرێنی ، مۆبۆتۆ لە هەولی دروست کردنی سیستەمیکی سیاسی بوو بۆ وولات کە خۆی لە کاریگەری (تەقەزوم)بپارێزی ،سیستەمی یەك حزبی دیکتاتۆری بۆ (جولانەوەی میلی شۆڕشگێڕ- de la Révolution Mouvement populaire ) بۆ وولاتی زائیردارِشت وپایەی مارشالی بە خۆدا ، بە نیاز بوو زائیر بکاتە شانازی ولە ژێر (ئیستعماری سەقافی) وتەبشیری رزگاری ببێت ،جل وبەرگ وزمانیشی دارِشت لەسەر ئەو بنچینەیە ،ناوە کۆنەکانی زائیری زیندوو کردەوە بۆ شاخ وداخ ورووبار و شوێنە گشتیەکان ،
ناویشی لە خۆنا ( Banga Mobutu Sese Seko Kuku Ngbendu Wa Za ) واتە مۆبۆتۆی موجاهیدی سەرکەووتوو هەر سەرکەوتو بێئەوەی کەس بتوانێ رێگری لێبکا) ، لەگەل زۆر نمونەی تەقەلای تری وا .

زۆربەی جار توانەوەی فەرهەنگی میلەتانی ژێر دەستە زیاتر لە ڕێی ئەو توێژەی پێی دەووترێ (ئینتلجنسیا)ی میلەتە ژێردەستەکە کە بەرژەوەندیان لەگەل میلەتی سەردەستە هەبوە جا بازرگانی بێت یان فەرمانبەری .. ، وەك لەگەل تورك لەسەردەمی ئیتحادوتەرەقی دوای 1908 ڕوویدا،یان دورگەکانی هندو بریتانیا ،هەندی وولاتی ئەفریقی وفرنسا ، لەو کاتانە مەترسی بە یەکجاری توانەوەو لە ناوچوونی میلەتیك یان پیکهاتەو کەمایەتیەك زۆر لەگینە ، ئەگەر ئەوەش نەبێت بەلای کەمی خۆرزگارکردن وپاراستنی ڕەسەنایەتی زۆر زەحمەت دەبێت ، ڕای واهەیە دەلێت رزگاری خاك ئاسان ترە لە رزگاری فەرهەنگ،چونکە میلەت مانای فەرهەنگ وکەلتوورو نەریت و زمانە ئەوانە نەمێنن یان شەرمت لێی کرد مەترسی نەمانی میلەتەکە دیتە واری جیبەجیکردن، ئەو توانەوەیە تەنهابەهۆی شکستی سەربازی ڕوونادات بەلکو زیاتر لە ڕێی (تقزم الثقافی) ڕوودەدات ئەگەر دەولەت وکیانی سیاسی نەبوایە ،چونکە دەولەت پاریزگاری لەو مەترسیە دەکرد،وەك ئیستا دەبینین وولاتانی عربی زۆر دواکەوتەو پشکەوتەو (متقزمن) بەلام بەهۆی دەولەتەوە پاریزگاری لە بوونی خۆیان دەکەن ،ئەوەیان وەك پاساوێکی تری کلتوری وفەرهەنگی سەرباری تری مافی چارەنووسی میلەتانە کە بەداخەوە ئەو پاساوە کەمتر کەوتۆتە نێو یاسای دەولی ، یەکێ لەو میلەتانەش میلەتی کورد بوە هەم تووشی ئەو دەردە بوە هەم مەترسی لەناوچوونی هەبوە ئەگەر بەرگریەکی بەردەوام و هەمەلایەنەی لە خۆی نەکردبایە ، رەگی ئەو دەردەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرۆسەیەی لە 1908 بەدواوە دەست پیدەکات و،بە دووبارە بوونەوەی شکست تا ئەو دواییەی ئەنفال وکیمیاوی و وێرانی وادەکا لە کرۆمۆسۆمەکانی تاکی کورد شکست گیربێت،کەمتر متمانەی بەخۆی ماوە، کاریگەری سیاسی و دەروونی و فەرهەنگی قووڵی بەجێ هێشتووە، بۆیە لای کۆمەڵگەی کورد وادەرکەوتووە هەرچی لەدەرەوەی کورد بێت مەزن و گرنگ و پتەو بەچارەنووسە، هەرچی لای خودی کوردیش بێت بچووك و دەڤەری و لەرزۆك و بێچارەنووسە، تا وای لێهاتووە شەرمی پێبێت، بۆیە دەبینین بەشێکی زۆر ئینتمای نیشتمانی و نەتەوەیی و ئاینی و فەرهەنگی لاواز بووە، بەخێرایی دەگۆڕێن، بەخێرایی جل وبەرگ و دیمەنی خۆیان دەگۆڕن، زمان و نەریتیان دەگۆڕن، نەتەوەیان گۆڕی، هەتا ئاینیش دەگۆڕن.

ئەوەیە (تقزم الثقافي)، هەربۆیە دەبینین هەتا ئەو ساتە بەدەگمەنیش تەیار و مەدرەسەیەکی عەلمانی نادۆزیەوە لەسەر ڕێبازی زانا و ناودارێکی کوردستانی بێ، باسی کەلتوور و نەریتی کوردستان بەنێگەتیڤی دەکرێ، خۆ لە فکر و فەلسەفە و تیۆری سیاسی بەتایبەتی لە مارکسیەت، مام جەلال گەلێ زیرەك و داهێنەر و بلیمەتێکە بەدەگمەن لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ولاتانی عەرەب بە ئەندازەی ئەو بیریارە شارەزا هەبێ، کەچی تەیارە عەلمانیە کوردستانیەکان بەهۆی دەردی (تقزم) وپاشکۆی خەست هەریەکە لە (هۆشی مین، ئۆگستینیتۆ، ترۆتسکی، ماو.. هەتا (ڕەوتی کۆمەنیست-کوردستانی باشور) بەو دواییە کەسی وایان دەست نەکەوت (منصوری حکمەت)یان کردە پێشەوا، چونکە کورد نەبوو (فارس) بوو، خۆ (عبدالله ئۆجەلان) مارکسیەتی واقعی و شۆڕشگێڕتریش بوو بەلام  کورد بوو پێی تێرئاو نەبوون، زۆر نمونەی تری زەق هەیە لەوبارەیەوە ، وەك ئەوەی لەکوردستان بەدەگمەن ناوزەدی ڕەوشەنبیریکی گەورە بە فەیلەسوف وزانا ناکرێت ، تەنانەت گەلێ جار بەرهەمی کوردەکە وەلا دەنرێت  هی بیانیەك دەکرێتە سەردێر ،حاجی قادری کۆیی زۆر پیش (نیکۆلای دوەمی روسیا)ناوی لە دەولەتی عوسمانی بە لاوازونەخۆش برد کەچی هەر بۆ نیکۆلای دەگێڕنەوە ، لەوەش مەترسیدارتر سەرکردە کوردەکان چەندە پاك بووینە بۆ ئاین ونیشتمان ،بەلام لەلایەن عروبیەکان بەبوختان (شیخ سعیدی و شیخ محمودو مەلامستەفاو..) تەواوی دۆزی کورد دەدەنە پالّ پرۆژەی ئیستعمارو زایۆنی و وولاتانی عربیش پیشڕەوی رزگاری وهەلگری ئالای ئاین ،شۆڕشەکانی کوردستان ئینفسالی وئینگلیزی وروسی بوە کەچی شۆڕشێکی خیانەتکاری وەك شریف بن حسین بە (ثورة العربیة الکبری) وەسف دەکەن ، کورد شەرم دەکا شانازی بەو سەرکردەو سیرانە بکاو ناوی ئاوا زلیان بۆ دیاری بکا .

دەردی تەقەزوم وادەکا ئەو جۆرە پاشکۆیی ولاساییکەرەوە بێت نەتوانی بە ووردی جیاوازی لە نێوان سوود وەرگرتن لە ئەزموونی میلەتان و پاشکۆیی بکەی لەلایەك ، لەلایەکی تریشەوە لە بە دواکەوتنەکە زیاتر لاسایی لایەنی سەلبی بکەیەوە نەك ئیجابیەکەی ،با هەر نمونە لە کوردستان وەرگرین ،لە پرۆسەی لاسایی وتەقەزومی حزبە کوردستانیەکان بەشی عەلمانی کردوویانە ئەوەیە لەنێو ئەو ئایدیۆلۆجی و تیۆری سیاسی و فەرهەنگی و ئەزموونەکان زیاتر لایەنە نێگەتیڤەکانیان

هاوردووه، نەك پۆزەتیڤ[290]، لە ئەزموونی بزوتنەوەی شیوعیەت، ئۆرۆشیوعی چاكتر بوو لە ستالینیە شیوعیەكان، كەچی ماركسیەكانی كوردستان ستالینیانە بوون، لەنێو وجودی جیهانی تەیاری سارتەری زیاتر بێبڕوا و توند و ڕەشبینە، تەیاری (كیركیجاردی) زیاتر بەلای میان ڕەویە.. كەچی وجودیەكانی كوردستان سارتەری بوون نەك میانڕەوەكە، بە هەمان شێوە وا ئێستاش كە ڕوویان وەرگەڕاوە ڕوولە لیبرال دیموكراسی وئەزمونی ڕۆژئاوایی ، لەو سەرمەشقیە نوێیەش لای سەلبیەكانیان وەرگرتووە، خۆ ئەو عەلمانیەتەیڕۆژئاوا یەك شت نیە، هەر ئەو عەلمانیەتە سیستەمی ئیمپریالیزم وهەردوو جەنگی جیهانی و تۆرانی ونازی وفاشی* و شۆڤێنی وبەعسیەتی هێناوەتە بەرهەم ..، سەرەرای دەردی لیبرالیەتی كۆمەڵایەتی، بازاڕی ئازاد، چینایەتی و ڕەگەزپەرستی، دوورە ئاینی و ئەخلاقی ..وەك لایەنی سەلبیەكەی، لایەنی ئیجابیەكەی ڕۆژئاواش بریتیە لە دیموكراسی وپرۆسەی سیاسی، مەدەنیەتی، دەستگۆڕی دەسەڵاتی، تەكنەلۆجیاكەی، ئازادی ڕادەربڕینی، سەروەری یاسا، خۆشەویستی وولات..جا با وردبینەوە دەبینین عەلمانیەتی كورد هاتووە لە دیموكراسی و ئازادی و دەستگۆڕی دەسەلات و زانست و تەكنەلۆجیا ڕاستەقینەكە لای داوە یان تەنها ناوی وەرگرتوە، یەخەگیری باقی سەلبیاتەكانی تر بووە هێناویەتی بەسەر كوردی دا پەیڕەو دەكا.

دەردێكی تری (تقزم الثقافی) ئەوەیە لاسایی لایەنی بەسەرچوی میلەتان دەكاتەوە ، لەسەروو باسی ئەزموونی رۆژنامەی (یەكسانی) مان كرد لاسایی كردنەوەی ڕۆژنامەیەكی ئەڵمانی بوو بەناوی (گلایخایت- واتە یەكسانی) لەسالی1891ز دەردەچوو، واتە پێش 104 سال لەمەوپیش، ئەویش كۆمەڵێك ئافرەت بەڕێوەیان دەبرد، ئەو ئەزموونەی گلایخایت 25 ساڵی خایاند و شكستی هێنا، لاسایی ئەزموونێكی شكست خواردووی پێش 104 ساڵ لەمەوبەری ئەوروپی كراوەتەوە، ئەودەردە ڕێك بەرجەستەی (تقزم الثقافي)ە ، لەسەر هەمان تراز پارتی كریكارانی كوردستان(پ ك ك) نەچوە لاسایی پارتی كریكارانی بریتانیا بكاتەوە ،بەلكو لاسایی پارتە كریكارەكانی جیهانی شیوعی

---

[290] ئەگەر لایەنە عەلمانیەكان تووشی ئەو دەردە خەستە بووینە، ئەوا لایەنەئیسلامیەكانیش توشی لاسایی خەتی ئیسلامی عەرەبی بووینەوە،بەلام لاسایی لایەنە سەلبیەكانیان ناكەنەوە وەك عەلمانی كوردلاسایی لایەنی سەلبی عەلمانی عەرەب دەكاتەوە.

*ئەو عەلمانیەی ئیستا لە جیهان پەیرەو دەكری ئەندازیارەكەی (مۆسۆلینی سەرۆكی بزوتنەوەی فاشیە ) لە سالی 1929 جاڕی دا كە ریكەوتنی لەگەل پاپا كردووە بۆ دابەشی دەسەلاتی ئاینی ودونیایی بەو شیوەیە .:مرۆڤ لەبوونیەوە تامردن بۆ مۆسۆلینی بیت لە دوای مردنیش بۆ پاپا بیت هەتا قیامەت!! بڕوانە (مەوسوعەی جودی-دانەر).

کردۆتەوە ، پارتی کریکارانی بلجیکی لە1885 دروست بوە،پارتی کریکارانی مەجەری لە1918 دروست بوە، پارتی کریکارانی ڤیتنامی پارتی کریکارانی ئەلبانی ، کەچی هەمو پارتە کریکارەکانی تر لە ناو چوون تەنها ئەوەی بریتانیا ماوە.

ئەو دەردە ئەوەندە کوشندە و خەستە تارادەیەك بەشێکی ئیسلامیەکانیشی گرتۆتەوە، زۆربەیان لە گفتوگۆ پالپشت دەکەنە سەر زانایەکی غەیرەکورد،هەروەها ڕەچەلەکی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی کوردستان دەدەنە پالّ ئیخوان یان فکری بیانیەك کەچی دەتوانین بلّێین ئیسلامی سیاسی (بەزاراوەی باوی ئیستا)یەکەم جار لە کوردستان لە سەر دەستی نەورەسی سەری هەلّدا،وەك موجەدیدێك فکری ئیسلامی نویّ کردەوە .

ئەوەی زیاتر مەترسی لەو دەردە دەکرێت بەوشێوەی ئێستا بەبێ بەرنامە ئەو جۆرە میلەتانە چووینە نێو عەولەمە وەك ئافرەتێکی نەشارەزای دەشتەکی لەناکاو وبەبێ کۆنترۆل بکەویە شارێکی پراگماتیك ، هەموو میلەتان بەبەرنامەیەکەوە چوونە نێو عەولەمە کەنەبێتە دەرد بۆیان، چونکە عەولەمە چاك وخراپت پێکەوە بۆ ڕاپێچی ناو مالّ ومیللەتەکەت دەکا، مەرج نیە نەریت وفەرهەنگی وولاّتانی تکنۆلۆژیدار هەمووی ئیجابی بێت، زۆر لایەنی سەلبی وای لەگەلّە بە پێی یاسایی وئاینی پێیان پاك نەکرایتەوە وەك فایرۆس دێت، پێویستە دەسەلاّتی کوردی وریا بێت لایەنەچاکەکان وەرگریّ نەك خراپە .

لە ڕۆژئاوای ئێستا ئەو لایەنە چەندە جوانە پەیڕەوی کەلتوری ئیسلام بە فەرمودەی (الناس سواسیة کأسنان المشط) دەکەن و دەبینی بەرپرسان و سەرۆك و خەلّکێکی سادە یەکسانن بەرامبەر یاسا، بەلاّم عەلمانیەکانی جیهانی عەرەبی و کوردی پەیڕەوی کەلتوری ئەوروپا دەکەن بەپێی فەرموودەی ئەرستۆ کە دەلّیّ (الناس لیسوا متساوون کأسنان المشط)، دەبینین بەرپرس و سەرۆك و خزمەکانیان ڤیتۆیان هەیە، لەسەرووی یاسان، حزب و دەسەلاّت وەك مولّك بۆیان بەمیراتیش دەمێنێتەوە، پێکهاتەی جەستەی بەرپرسان لەزێڕەو ئی هاوولاّتیش لە تەنەکەیە، پلەیان جیاوازە وەك ڕۆمی کۆنو براهما وشادرای هندین، خۆ ئەگەر عەلمانیەتی ئێرە باوەڕی بە کەلتووری ئاینی نیە لەو

فەرمودەی سەروو، دەبا پەیڕەوی ڕۆژئاوا بکەنەوە لەو لایەنە پۆزەتیڤە، نایکەن و ئەو جیاوازیە زۆرەی لێ پەیدا بووە، وەك لەو خشتە بەراوردەی خوارەوە دەردەکەوێ:

| بەرپرس و سەرۆك لێرەو وولاتانی عربی | بەرپرس و سەرۆکی ڕۆژئاواو وولاّتانی یاسا سەروەر |
|---|---|
| 1- لە سەرووی یاسا و لێپێچانەوەو ڕای گشتیە. | 1- پابەندە بە یاساو موئەسەسات وڕای میللەت. |
| 2- دیکتاتۆرەو شایەنی ڕەخنەو بەخۆداچوونەوەو هەڵسەنگاندن نیە. | 2- ئازادانە ڕەخنەی لێ دەگیرێ،دادگایی دەکرێ، لادەدرێ، کارەکانی هەڵدەسەنگێنرێ. |
| 3- ژیانێکی فیرعەونانەو لە کۆشك و تەلار و دەسەلاّتێکی رەهای سیاسی و مالی و دەستوری هەیە | ژیانێکی سادەو دەسەلاّتەکانی بەپێی دەستورەو تەنها موچەی خۆی لەدەستە. |
| 4- حزب و دەسەلاّت موڵکی خۆیەتی. | 4- دەستگۆڕی دەسەلاّت هەیە. |
| 5- خەڵك و نیشتمان و پیرۆزیەکان و ئاسایشی نەتەوەیی لە خزمەتی سەرۆکن. | 5- سەرۆك خزمەتکارە. |
| 6- بەرژەوەندی تایبەتی سەرۆك لە سەرووی هەموو | 6- بەرژەوەندی وولاّت لە سەرەووی هەموانە. |

| | |
|---|---|
| بەرژەوەندییەکە. | |
| زۆری تر... | زۆری تر... |

**چەقی قەیرانەکە:** هەڵبەتە ئەو دۆخەی سەروو باس کرا لەنێو ڕۆژهەڵات و هەمو جیهانی ئیسلامی نیە، هەتا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش، ئەوەتا هەر لە نزیك خۆمان، بینیمان (أ. خمینی)لە ئێران چ جۆرە ژیانێکی سادەی لەو خانووە کۆنە سادەیەی بردە سەر تا مردن، بێ موڵك و سامان، ئەوا لە ماوەی (34) ساڵ 7 سەرۆك کۆمار بگۆڕن بە هەڵبژاردن وخاوەنی فەرهەنگ وتێڕوانین وبینای شارستانی نوێن ،قەیرانی توانەوەو (تقزم)یان نیە ،بە هەمان شێوە ئەزمونی نوێی تورکیا ، وولاتانی تری وەك مالیزیاو پاکستان وزۆری تر توانیویانە لەگەل سەردەم بگونجێن وپاریزگاری لە ڕەسەنایەتی خۆشیان بکەن..، ئەو دەردە زیاتر لەنێو دەسەلاّتدارانی عەرەب هەیە، دەسەلاّتدارانی کوردیشتی گرتۆتەوە لە ڕێی لاسایی وپاشکۆیی .

قەیرانەکە لەوە دەست پێدەکات کە میلەتانی عەرەب لە شارستانی وتکنۆلۆجیا و فەرهەنگ دواکەوتون پیویستیان بە یارمەتی رۆژئاوا هەیە ،بەلام نایانەوێ هەمولایەکیان بکەوێتە ژێر ڕەحمەتی رۆژئاوا ، کەچی ئەو پاریزگاریە ناکرێ لە ژێر ئارستەیەکی لائیکی دەسەلاتداری عربی ، ئەوەی ڕێی لەو پرۆسەیە گرتوە ئاینە پاریزگاری لە ناسنامەکەیان دەکا ،چونکە فەرهەنگی عربی پەتی بۆ ئەو سەردەمە وەك پیویست ناگونجێ بۆیە بە بێ ڕەهەندی ئاینی فەرهەنگی عربی وفەرهەنگی رۆژئاوایی نەك ناکەونە رکەبەری بەلکو هەر مەیدانخوازیشی پیناکرێ ، ئەو دەردە لە بنەچەدا لەوە دێت هەندێ دەسەلاتی ئەمەوی وفتوای فقهی ڕێی لە کارلێکیکی سروشتی میلەتە جیاجیاکانی نیو ئەمەتی ئیسلامی گرت بە پرۆسەیەکی میژووی کارلیك بکەن وبەربەرە فەرهەنگی بالاّ لە زاوزێیان بەرهەم بیت لە ژێر دەقەکان ، ئەوان هەولیاندا ئەو کارلیکە لە ژێر بەهاو ڕەسەنایەتی عرب بێتە دی ، لەوەوە ئیستا فەرهەنگی عربی وفەرهەنگی ئاینی لێك جیایە ،چەقی قەیرانەکە لێرە دێت کە فەرهەنگی عربی توانای ڕووبە ڕوو بوونەوەی فەرهەنگی رۆژئاوایی نیە ،جا دوو ئەگەریان لەپیشە یان

دەبێ لەدەورەی فەرهەنگی عربی بهێننەوەو لە جهانی نویێ بە جیبمێنن یان بەشی هەرە زۆریان لە شارستانی وفەرهەنگی سەردەم بتوێنەوە .

کەواتە ئەوە فەرهەنگی عربیە تووشی تەقەزوم بوە بەرامبەر رۆژئاوا نەك ئیسلامی ، یان دەتوانین بلێین ئەوە موسولمانە تووشی ئەو قەیرانە بوە ، ئەگینا هەمان ئەوکارلیکە فەرهەنگیەی کە ئیستا دەبێتە هۆی تەقەزومی جیهانی ئیسلامی و دەبێ جیهانی ئیسلامی خۆپارێزی لێبکەن ،ئەوا بەهەمان ئەندازە رۆژئاوا تووشی ببوو ، لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەوروپا تووشی ئەو دەردە ببوو کە لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو فەرهەنگی ئیسلامی وئۆروپی ئەوان تووشی تەقەزوم دەبوون ،ناچار خۆپاریزیان دەکرد لە ئەدەبیات وفەرهەنگ و ئیسلام تا ئەو ڕادەیە کتیبەکانی ئیبن روشد وئەوانی تریان دەسوتاند ،لەو بارەیەوە (ئالان دولیبرا) لەکتیبەکی(کیفیة التفکیر فی القرون الوسطی)بە ووردی لەسەر ئەو بابەتی (تثاقف) و تەقەزومی ئۆروپی وەستاوە بەرامبەر جیهانی ئیسلامی ،دەلی هەتا شارەزای کتیبەکانی ئەرستۆو ئەفلاتونیش نەبوون لەڕێی جیهانی ئیسلامی بۆیان هاتەوە[291] .

لە تویژینەوەیەکی نوێی(کورت فلاش)بەناوی(من ابن رشدالی المعلم ایکهارت) دەلێ کاریگەریە بنچینەکەی ابن رشدلە سەدەکانی ناوەراستی ئەوروپا یەکجار زۆر بوە،بەتایبەتی گەلالەکەی (سازانی فلسفەو شریعەت)[292] .

ئەوەی زیاتر کیشەکە ئالۆز دەکا لەبارودۆخی ئاوادا چین وتویژە چاکسازەکانیش تووشی جۆرە دەردیکی وادەبن ، ئەو کاتە مانایەك بۆ یەکڕایی(ئیجماع) ودلنیایی و کۆدەنگی نامێنێ ، زانایان لە هەردوو بەشی زانستی و ئایینی پێیان وانیە هەمو کۆ دەنگیەکیان دروستبێت، لەوانە (هۆبز)، (نیتجە)، (دۆرکایم) لە هەموان زیاتر (میکاڤیلی) بە سەلبی دەڕوانێتە (یەکڕایی) و پێی وایە بەهەڵەدا دەچێ، ڕاستیەکەی هەمو کات کۆڕا بە هەلە داچوون نیە ،بەلکو لەو کاتانەی کە ئەو جۆرە میلەتانە تووشی (تقزم)دەبن ئەوا پێوەرەکان وەردەگەڕێن وکۆڕایی مانایەکی وای نامێنێ یانیش هەر

---

[291] تاریخ اوروبا ..ص160-161

[292] تاریخ اوربا وبناء اسطورة الغرب ص163 (هامش) .

پیچەوانە دەبێتەوە لە کۆمەلگەی وا ڕەشۆکی ، لای ئیمام علی هەر جێگەی مەترسی بووەو دەڵێ: (العوام، ینحنون بکل ریح، إذا تجمعوا ذروا، وإذا انتشروا نفعوا..)، کەواتە یەکڕایی مەرجی خۆی هەیە بۆ سەرکەوتن و پێکان و ڕاستی و دروستی، کۆڕاو یەکڕایی (اجماع)لە کۆمەلگەیەکی ساغ جیاوازە لەگەل کۆمەلگەیەك تووشی دەردی تەقەزوم بووبێتەوە ،ئەو نمونە بۆ باقی بواروئاستەکانی تریش هەر ڕاستە .

(9)

## پێشڕەوایەتی الطليعة vanguard ...

ئەوانەش دەگریتەوە (بەرە، هاوپیشڕەو، الجبهە(حیوان)، ئەرسنال،سەرقافلە، جیل القرأنی الفرید، پیشکۆچ) .-ماو ، المختارات ،المجلد 1، مصدر سابق ، ص؟؟

لە زمانەوانی کوردی بەو بەشەی هەرە پیشەوەی هەر کاروانێك دەووترێت پیشڕەو یان سەرقافلە ، وەك هۆنراوەو گۆرانیشواهاتوە: جەوێ جەوێ توو کارمامزی توو پیشڕەوێ ، لە رسوماتنامەکەی مەلا محمودی بایەزیدی بە (پش کۆچی)هاتوە لەسەردەمی خۆی[293] ، وادیارە لە زمانەکانی تریش هەر وایە لە (دائرە المعارف) دەلێت لەقاموسە کۆنەکانەوە بە بەشی بەرایی هیزەگەورەکان ووتراوە (پیشڕەو)[294] ، لەکۆنەوەش بە وئاژەلانەی لەهەرە پیشەوە ڕەو دەکەن وئەوانی تریش بەدوای دێن ووتراوە (الجبهە) ئەوجۆرە ئاژەلانە زەکاتیان لەسەر نەبوە لەبەر ئەوەی ئەرکێکی زیاتریان بینیوە [295].

لە بنەچەدا لە لایەنی ترەوە وەرچەرخاوەتە چەمکیکی سیاسی، زیاتر لەسەردەمی بوهاری مارکسی وەك زاراوەیەکی سیاسی سەری هەلدا، بەو مانایەی پەیامی مارکسی پەیامی چینی کریکارە کە پیشڕەوی باقی چینەکایەتی کۆمەلایەتیە ، لە دۆخی ئیستا کەمتر بەکاردێت ،بەلام زۆرپەیوەندیدارە بە پیچەوانەی چەمکی پاشکۆیی ولاساییو خۆبەبچوك زانی ،تەنها زانیاریەکان پێچەوانە بکەیەوەلەلایەك ،لەلایەکی تر سنوری شمولی پێشڕەوایەتی دیاری بکەی بەهۆی دیاری کردنی سنوری گەشە(تطور)بە ئۆتۆماتیکی ڕاڤەی پیشڕەوایەتیە، بۆیە تەنها ماندووبوون وکورتە باسێکی پیویستە ، هەر لێرەش دەردەکەوێ کە بۆداگیرکردنی میلەتان هەولدراوە پیشڕەوەکانی تێك بشکێنرێت ، وەك لە(پرۆتۆکۆل ژ:1) واهاتوة : ان يحطم طليعة الشعب وبذلك نضع قوة ارادة الشعب تحت رحمة اولئك

---

[293] دەقی رسوماتنامەکە لەکتیبی (عادات ورسوماتنامەی اکرادیە) — وەرگیرانی لەروسیەوە :د شکریە رسول ل123

[294] موجز دائرة المعارف ص6897

[295] قاموس المصطلحات الاقتصادية فی الحضارة الاسلامية ص142

الذين سيجردونه من قوة طليعته. عباس محمود عقاد راڤەی (طليعة الشعب-پیشڕەوی میلەت)ی واکردوە: المراد بطليعة الشعب الممتازون الذين يتقدمون طوائف الشعب ويتزعمونها ويقضون في أمورها، واليهود يركزون ضرباتهم على هؤلاء المتزعمين، فإذا حطموهم تحطمت تحطمت دون مشقة الطوائف التي تسير وراءهم بلا تفكير[296]، زۆربەی جار لە ئەدەبیاتی ئیسلامی هاوچەرخ پیشڕەوایەتی و(نوێبوونەوە-تجديد)یان پێکوە بەستوە،لەوەوە بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش چەمکی پیشڕەوایەتی بۆ خۆیان هەلدەبژێرن ،وەك د قەرزاوی لە کتیبی(اولويات حركات الاسلاميه)وای گوزارش کردوە : تكوين طليعة إسلامية , قادرة - بالتكامل والتعاون- على قيادة المجتمع المعاصر بالإسلام , دون تقوقع ولا تحلل , وعلى علاج أدواء المسلمين من صيدلية الإسلام نفسه ، طليعة يجمع بين أفرادها : الإيمان العميق ، والفقه الدقيق , والترابط الوثيق .

لە کوردستان لەسەردەمی شۆڕشی نوێ لەنێو (ی ن ك) زیاتر هاتە مەیدان ، باڵەکانی ناو (ی.ن.ك) لەسەر داهێنانێکی مارکسیانەبوو،بەهۆی بنەمای یاسای سێیەمی (مادیەی دیالیکتیك) (یەکێتی و ململانێی لایەنە ناکۆکەکان )[297] بەجۆرێك کە (یەکێتیەکە) بریتی بێ لەسەر بنچینەی نیشتمانی و رزگاری کوردستان و (ململانێکەش) بریتی بێ لە (ململانێی چینەکانی کوردستان) هەر لە چوارچێوەی (ی ن ك)، ناوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لەوفەلسەفەیە هاتووە، چەمکی پیشڕەوایەتی لێرە لە پێکهاتەی (ی ن ك) بەرجەستە ببوو کە لە کۆتاییدا (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) ڕۆلی پیشڕەوی دەبینی ،ئەوەش بەشێك بوو مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕش کەبریتین لە و مەرجانی خوارەوە (لە چوزارچێوەی مارکسی) :

1- پێشڕەوێکی مارکسی (کۆمەڵە).

2- بەرەیەکی فراوانی چینەکان (یەکێتی)

3- سوپایەکی توندوتۆڵ (هێزی پێشمەرگە).

---

[296] محمد خليفة التونسي- الخطر اليهودي(بروتوكولات حكماء صهيون) ت: عباس محمود العقادالطبعة الخامسة 1980م ص67 .

[297] بۆ زانیاری سەرنج بدە (المادية الدياليكتيكية) نووسینی (جماعة من اساتذة سوفيت) بەشی حەوتەم.

ئیتر باس وخواس ومشت مڕێکی زۆر لەسەر چۆنیەتی بوونی پیشڕەوی کرا، تەوەرەکان لە نێوان تەیارو مەدرەسەکان نەبوو ،بەلکو هەمو لایەك كۆك بن پیشڕەوی دەبێ مارکسی بێت مادام کۆمەلە نوینەرایەتی چینی کریکاری پرۆلیتاری دەکا کە ئەو چینەش پیشڕەوی بزوتنەوەی میژوو دەکا .

باسی جیاجیای چەمکی پیشڕەوی :

مەبەست لە پیشڕەوی ئەوەیە تۆ لەپیشەوەیی وخەلکی تر بەدوات دێت، تۆی دڕ بە پیشگری وئاستەنگەکان دەدەی ، ستیڕنی جولەو گەشە لەدەست تۆ دەبیت، پیشڕەوی وسەرکردایەتی تا ڕادەیەك لیك جیان ،هەندێ جاریش ناکۆکن ،زۆر جار سەرکردە لە پشتەوەی ڕووداوەکان برجوازیانە ولە پشت تەختەیەك بیرۆکراسیانە ڕێنمایی دەدات ،هەرچی پیشڕەویە هەردەم لە هەرە پیشەوەیە ،جاریش وایە سەرکردەو پیشڕەوایەتی جووت دەبن ئەوەیە بنەمای سەرکردە کاریزم و ئەفسوناویەکان،لە هەمان کاتیش مەرج نیە لەگەل گیانی دیموکراسی ڕیك کەویت ،چونکە سیستەمی پیشڕەوایەتی ناوەستێ لەسەر ڕاوێژو زۆرایەتی دەنگ وحوکمەکانی میژوو بە سروشتی خۆی ،بەلکو چینی پیشڕەو ئەو حوکمە میژوویە پیش پیگەیشتنی دێنێتە دی .

زۆر جار لە نێو کۆمەلگە بەو توێژە پیشڕەوانە ووتراوە ئینتلجنسیا،یان ڕەوشەنبیر(المثقف)بە پێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار زاراوەی موسەقەف لەگەل کاریگەری وپیشڕەوایەتی لەکۆمەلگە دەگەڕێتەوە بۆسالی 1849ز کاتێ بەیانیك لە فرنسا بەناوی ئەو رەوشەنبیرانە دەرچوو(ئەمیلزۆلا-تۆل فرانس-مارسیل برۆست-لیۆنپلۆم) بەناوی (بیان المثقفین)[298]،ئەو چینە بەگشتی بریتی بووینە لە کەسانی زانستپەروەر وئەندازیارو پزیشکان ونوسەران ورەوشەنبیرانی ئاینی  کە جیاواز ترن لەخەلکی سست ورەشۆکی ، ئەوانە زیاتر چالاکی فکری وداهێنانیان کردوە ،لە جیهانی سێیەم ئەوانەن پیشڕەوی گۆڕانکاریەکان، لە نێو میلەتانی ژێر دەستە ئەوانە دەبنە هەوێنی بزوتنەوەی رزگاریخواز و هەتا شۆڕشیش . لە مەوسوعەی عربی و لە ئەدەبیاتی تری حزبی بەعس بە جۆریك باسیان لە

---

[298] عبدالرزاق عید-الاسلام والحداثة ص34

(طليعة)يان كردوه بەلام لە چوارچيوەی فكری بەعسی و (**طلائع**) و پەروەردەو سەربازگەو[299] ..بەلای راستەقینەکە نەچوە ،د علی شریعەتی وسیدقوتبیش باسی ڕەوشەنبیری پیشڕەویان لەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی کردوە،بەناوی تر وەك(جیل القرأنی الفرید) ، زۆر جاریش ئەو چەمکە بۆ دۆخیکی سەلبی وەردەچەرخا ، بە ناوی پەیامیکی میژوویی وپیشڕەوی وەرگرتن دەبوە دیکتاتۆری وخوین ڕشتن وقۆرخی ئازادی و هەندێ جار دەبوە جۆریکی تر لە سیۆکراتی مەدرەسەیەك ، بە ناوی ئەوەی گوایە پیشڕەوی میلەتێك یان نەتەوەیەك دەکا بۆ ئامانجی مەزن ،وەك حزبە نەتەوەییەکان ، لەوانە پەیدابوونی (تۆرانی ونازی وفاشی و بەعسی ..) ، بە جۆریکی تریش حزبە مارکسیەکان پیشڕەوایەتی گەشەی تەواوی کۆمەلگەیان دەکردو لەلایەن میژوەوە (تەفویزیان پێدرابوو-سیۆکراتی میژوویی)جۆریك لە سیۆکراتی مادی ،ئەگەر سیۆکراتی ئاینی تەفویزیان لای خودای خۆیان بوو ئەوە لای شیوعیش کە لەجیاتی خودا سروشت ئەو رۆلەی دەبینی تەفویزی پیدا بوون کە پیشڕەوایەتی کۆمەلگە بکەن ، بە هۆی نوینەرایەتی پرۆلیتاریا کە پەیامیکی حەتمیەی میژوویی هەلگرتوە ،بەخەلکی تر ناکریٚ جگە لە حزبە شیوعیەکان .

زۆر بەگمەن لە ئەدەبیاتی ئاینی ئەو چەمکە دەبینی بەلکو زیاتر باس لە (قدوە)کراوە نەك پیشڕەوی،بەلامبە زاراوەی تر باسی ئەو جۆرە پیشڕەویە کراوەو دژی دواکەوتن وتەبەعیەت وەستاون (وکذلك جعلناکم امة وسطا لتکونوا شهداء علی الناس ویکون الرسول علیکم شهیدا )واتە ئێوە پیشڕەو بن بۆ خەلکی، لە گوتارێکی شیخ ئەمجەد زەهاوی 1953/3/22 بەبۆنەی هاتنە سەرتەختی شافیسەلی دوەم لە عیراق - لەدوای سایکس پیکۆ و دیزاینی رۆژهەلاتی ناوەراست ونەمانی خەلافەت دەلیٚ:(موسولمانان ئیستا ریسوان لەچاو جارانی سەربەرزی،هەژربوون لەدوای دەولەمەندی،لاوازبوون دوای بەهیزیان ،دواکەوتەو پاشکەوتە لەدوای ئەوەی ئەوان پیشڕەو بوون)[300]، ڕای فقهیش وایە کەلە (معجم المصطلحات اصول الفقه ... د. قطب سانؤ) وا هاتوة: (: التجدد .. ثبات الاصل .. وملاءمة فرعه لکل مایستجد ) ، لەو پێناسە زیاتر دەبێتە پاشکۆ نەك پێشڕەو ،بۆیە تاڕادەیەك دەبینین فقه

---

[299] الموسوعة العربیة ج12ص612 .

[300] الامام امجد الزهاوی –کاظم المشایخی ص312

پیشڕەو نیە ، لەسەر ئاستی دەولیش باس لە  پیشڕەوی گەشەی رۆژئاوا لە نێوان بریتانیاو فرنساو ئەلمانیاو ئیتالی کراوە [301] .

دەمێنێ بڵێین زۆر بەدەگمەن وارێککەوتوە پیشڕەوی ودۆزینەوە بە(هاوپیشڕەوی )بێت ،واتە چەندلایەك پێکەوە پیشڕەو بووبن چ لە ئاستی سیاسی چ لە ئاستی فکری و زانستی ،تەنانەت واش ریکنەکەوتوە دووکەس پێکەوە دۆزینەوەك بکەن بێئەوەی هەماهەنگیان نەبێت ، هەرچەندە ئەو دۆخە لە نێوان دوو زانا ڕوویدا،لەماوەیەکی نزیکی یەك هەریەکە لە (لیبنتز) و(نیوتن)پاگندەی ئەوەیان کرد (حساب التفاضل)یان دۆزیتەوە ،ئیستا دەلێن هەردوولا ڕاستیان کردوە هەریەکە بەجیا لەوەی تر دۆزیتیەوە[302] نازانین چەندە ڕاستە .

**سەربردەو فەلسەفەی پیشڕەوایەتی :**

لە فەرهەنگە ئیسلامی وعربییەکان زیاتر بەو بەشەی لەپیشەوەی سوپا بووینە ووتراوە (طلائع) ،دۆخێکە تایبەتە بۆ ئەو جۆرە سیستەمە جولانەوەیەی کە گەشە کردنی تێدایە ، لەو سیستەمانەی جولەی بازنەیی (پیشڕەو) مانای نامێنێت ،واتە پیشڕەوایەتی بۆ جولەو گۆران لە سروشت وگەردوون مانایەك نابە خشیت ،فلسفەی مادی پیی وایە شتومەکە جیاجیاکانی بونەوەر بە ئادەمیزادیشەوە بەرهەمی چالاکی مادەوسروشتەلە ئەنجامی پرۆسەی گەشە ، وەك لاپلاس وهولباخ کوندرسیە ،دیدرو،کلود هیلفشیس، جان جاك روسو، وفولتیر..)وهکسلی شۆبنهاوەروئەنجلس.. ،ئەوانە خاوەنی تیۆرێکن بەناوی تیۆری "پەرەسەندن" کە باوەشی لە تیۆری "داروین" فراوانترە، ئەوانەی سەرووو وداروین ولامارك وسپینسەر و.. دەلێن مادە لەتەمەنی ئەزەلی و ومانی هەتا هەتایە لەگۆڕانکاری دایە لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێك گەشەدەکات لەسادوییی وخوارەوە بەرەو ئالۆزی وسەرووەوە[303] ، لێرەوە زەمینەیەکی لال بۆ پیشڕەوایەتی دروست دەکات ،شۆبنهاوەر دەلێ سروشت مادەیە،مادەش تەنها ئەو

---

[301] تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص149

[302] موسوعة المشاهیرالعالم فی العلوم والفکروالسیاسة ج1 ص46.

[303] ،فیکۆ یەکەم فەیلەسوف بوو ئەو جۆرە جولەو گەشەیەی بە (سپرینگی) لە خواروو بۆ سەروو وەسف کرد.

کاتە مانای دەبێ کە گەشە بکاو بەرهەمی هەبێ بۆیە سروشت بە تیکڕایی لەگەشەی بێ ووچانە[304]،ئەنجلس بەڕەهایی تر دەلێ:(ئەو گەشەیەی بەهۆی پرۆسەی(نفی النفی) دێتە دی ئەوەگەشەیەکی کراوەیی پیشکەوتوو دەبیت[305] ، ( هەلبەتە ئەو پرۆسەیەش لە ئەنجامی بوونی (تناقض)لە ناخی هەمو شتیك ، یاسایەکی گشتیە بۆ جولێنەری سروشت و کۆمەڵگە و فکر وەك فاکتەری ناوەکی، بەوپێیە هەمو جولەیەك گەشەیەو لەکۆتایدا هەمو سروشت وگەردوون وبوونەوەر لە گەشەکردندان ..تا ئیرە ڕای ئەوان بوو بەهەمان پیوەریش چەمکی پیشڕەوایەتی دیاری دەکرێت، واتە بەو پێیە بێت لە سروشتیش پیشڕەو هەیە ،هەر تەنها قەتیس نامێنی لە چالاکی کۆمەلگە ..بزانین چەندە ڕاستە؟

لایەنی هەرە لاوازیان ئەوەیە ناتوانن یەك نمونە لەو سروشتە بهێنێتەوە کە (وەسف ومەرجی تناقض) هەڵگری[306] ، ئینجا جوڵەو (تەتەور-گەشە) لێك جیان ، جولەی سروشتی بازنەییە لە شێوەی (ئاو-شلە-هەڵم-ڕەق-ئاو) (مریشك-هێلکە-جوجکە-مریشك)..، واتە لە سروشتدا نە گەشە هەیە نە(تناقض) ، بۆیەش پیشڕەوی تێدا نابیت، سیستەمی سروشت و سیستەمی گەشەی کۆمەڵ زۆر لەیەك جیایە، یەکێ لە هەڵە هەرە گەورەکانی فەلسەفەی مادیەکان ئەوەیە کە جوڵە و گەشەی کۆمەڵگە و مرۆڤیان بەبەشێك لە سروشت پۆلێن کردووە، لە ناو کۆمەلگەو مەیدانی فکریداتاکە مەیدانە کە سیستەمی گەشەکردن مانای هەیە ، بەهۆی بوونی ( هۆشی ) دەتوانێ سلبی و ئیجابی (چاکە و خراپە) ی خۆی لەیەکتر جیابکاتەوە و پەرە دەسێنێ .

ووردتر لە جۆرەکانی جولانەوە تەنها جوولانەوەی کۆمەلایەتی وفکری دەگریتەوە ، لەتێکرای جولانەوە (6) جۆر بەدی دەکرێ: (1-جولانەوەی میکانیکی 2-جولانەوەی جیۆلۆجی 3-جولانەوەی کیمیایی 4-جولانەوەی بایۆ لۆجی 5-جولانەوەی کۆمەڵگە 6-جوولانەوەی فکری )، سێ پۆلی

---

[304] المثالیة الألمانیة ص255.

[305] فریدریك انجلس- انتی دوهرینك- ص162-163

[306] لە زۆربەی کتێبە مارکسیەکان مەرجی دیالکتیکی تێدایە بەلام ماوتسی تۆنگ لە(حول التناقض) لەهەموان ڕوون ترئەو دوو مەرجەی نوسیە:1-هەردوولای (تناقض)مەرج بن بۆ یەکتر2-جێی خۆیان بگۆڕنەوە .

یەكەم جمو جۆڵی سروشتیە، زۆر جیایە لەگەڵ (3) جولاَنەکەی تری ژیانی، لەوانیش هەردوو جولانەوەی فکری وجولانەوەی كۆمەلایەتی رەهەندی گەشەیان تێدایە ، کەواتە پیشڕەوایەتی لە بەشی پیشەوەی ئەو گەشەکردنانە دەست نیشان دەكرێت وئەوە سنورو جیکەوتی  پیشڕەویە ، نەك لە 3 پۆلی یەکەم ،واتە لە جولەی سروشتی پیشڕەوایەتی نیە تایبەتە بە مرۆڤایتی .

کەواتە ئیستا دەتوانین بە ووردتر پیناس و وەسفی پیشڕەوی بکەین ،  دەردەکەویَ کە لە کاروانیکی سادەی مرۆڤ لە سەفەرا پیشڕەوی هەیە تا دەگاتە پیشڕەوی زانستی و تکنۆلۆژی وشارستانی وفەرهەنگی وکەلتوری و هەرە چالاکەکەی پیشڕەوی سیاسیە ، کە دەمەقالیەکی توندی لەسەر بوە ئاخۆ چ مەدرەسەیەکی فکری وسیاسی مەرجەکانی پیشڕەوایەتی هەیە ،لەو ڕوەوە مارکسیەکان خۆیان پیَ بیڕکابەر بوە ،بە کارهێنانی (پارتی پیشڕەو) بۆ لینین دەگەڕێتەوە ، پالپشتیان کردۆتە سەر تیۆریکی قوولی فلسفی وزانستی ومیژوویی ،  بەرای مارکسیزم کۆمەل لەرەوتی تەمەنی خۆیدا پینج شێوە (رژیمی کۆمەلایەتی _ ئابوری )  بەخۆوە دیوە ،کەلە 1-کۆمەلگەی سەرەتایی دەست پی دەکات2- ئنجا بەندایاتی3- دەرەبەگایەتی 4- سەرمایەداری 5- سوشیالیزم ... دەلێن وا بەرەو قۆناغی (شوعیەت ) دەرۆن ، ئەوجۆرە بۆچوونە بەگشتی پیَی دەوتریت( پەرەسەندنی ڕیَك —ڕاستە هیلی  ) ، ئەوەش پاساوی هەرسیَ یاسای فلسفی دیالیکتیکە بەتایبەتی یاسای (نەفی ئەلنەفی). لەراستیدا زانایانی (پەرەسەندنی- **تطوری** ) کۆمەلایەتی وەك ( سپینسەر ،داروین ،هکسلی،  لوپۆك ، پاخوفن ، مالکینان ، باستیان ، جیر ، فالکیز ..)، بەتایبەتی (مۆرگان) لەکتێبی (المجمتح القدیم- system of eans angaimty and aftarni) هەمان بۆچونیان هەبوو ،چونکە سەردەمی ئەو بۆچونانە گونجاو وباوی تیۆری پەرە سەندن بوە ،کە لەلایەن (داروین 1809-1881 ن ) پیشتریش لەلایەن (لامارك ) داڕێژرابوو، لەو تیۆرەدا کۆمەل لە رەچەلەکدا لەو ئادەمیزادانە هاتوون کە باپیرانیان گۆریلاوئاژەل بووە ،  بەو شێوەیە بۆ گەشەی هەر قۆناغێك چینیك پیشڕەو بوە ، لە وەرچەرخانی کۆمەلگەی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری چینی جوتیار پیشڕەو بووینە ،لە سەرمایەداریش بۆ سۆشیالیستی وشیوعیەتیش چینی پرۆلیتاریا پیشڕەو دەبن ، بەو شێوەیە پیشڕەوایەتی لە مارکسیەت دادگای میژوویی پیێداون لەدەست کەس نەماوە ، لە مەیدانی سیاسیش

لینین زۆر بەووردی زاراوەی پیشڕەوایەتی داهێنا لەبەرامبەر کاری سیاسی عەبەسی ،بە ڕای ئەوپیشڕەوایەتی وادەکا کاری سیاسی لە ڕەمەکیەوە وەرچەرخێنیە نەخشەو پلان وئامانجدار ،ئەو کاتی ئایدیۆلۆجیایەکی خەستیشی پێویستە،ئەوکاتی حزبی سەرکردە شی پێویستە[307]، بەڕای ئەوان سۆشیالیستی زانستی وسۆشیال دیموکراسی لەو دووڕیانە لێکجیادەبنەوە یەکەمیان بە هەبوونی پێشڕەو دوەمیان بە نەبوونی[308]-هەرچەندە رۆزا لۆکسمبۆرگ بۆ دروست بوونی حزبی شیوعی ئەلمانیا داوای پیشڕەویکی بۆ پرۆلیتاریا کردبوو ، لە سەر ئەو بنچینە تەیاری ماوی لە چوارچیوەی تیۆر دای رشتوە ،بوویتە بەشیك لە مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی،بە پێی ( ڕاڕەوی ماوتسی تۆنگ) شۆرش بەو مەرجانەی خوارەوە سەردەکەویت:

1- پێشڕەوێکی مارکسی

2- بەرەیەکی فراوانی چینەکان

3- سوپایەکی توندوتۆڵ

یەکێك لە نمونە بە هیزەکانی بەرجەستەی ئەو تیۆرە (ی ن ك) بوو لە کوردستان،(هەروەك لەسەروو کەمیکی باس کرا) باڵەکانی ناو (ی.ن.ك) لەسەر بنەمای یاسای سێیەمی (مادیەی دیالیکتیك) دروست کرابوو، کە بریتیە لە (وحدة وصراع المتناقضات)[309]ئەنجامی ڕەوتی گەشەی ناکۆکی و پێشبڕکێی باڵەکان دەبووە هۆی گەشەسەندنی یەکێتیش، واش دارشترابوو کە لە کۆتاییدا حزبێکی پێشڕەوی مارکسیانەی لێ دەربچووبوایە و یەکێتی کۆتایی بهاتبایە، لە بارەی پیشڕەویش ی ن ك وا دارژرابوو رێك لەسەر تیۆرەکەی ماوتسی تۆنگ ، بەشیوەیەك پیشڕەویکی مارکسی بریتی بوو لە (کۆمەڵەی رەنجدەران) ،بەرەیەکی فراوانی چینەکانیش خودی (ی ن ك) بوو ، لەشکریکی شۆرشگێریش هیزی پیشمەرگە بوو .

---

[307] إرنست ماندل- النظرية اللينينية في التنظيم- ترجمة: كميل داغر الناشر: دار الطليعة – بيروت ص11 ص17ص34 .

[308] جۆرج بولیتزر-اصول فلسفه الماركسيه ص276

[309] بۆ زانیاری سەرنج بدە (**المادية الدياليكتيكية**) نووسینی (**جماعة من اساتذة سوفيت**) بەشی حەوتەم .

ئەو چەمکە لە ئەدەبیاتی ناشیۆنالیزمیش تا ڕادەیەك بەدی دەکرێ ، لەکۆتایی سەدەی 19 وسەرەتای سەدەی بیست لەگەل زەق بوونەوەی هەردوو چەمکی نەتەوەیی ونیشتمانی و ململانێی کەلتوری وفەرهەنگی تیۆریکی زۆر لەبارەی پیشڕەوی تەواوی کۆمەلگە لەلایەن میلەت ورەگەزیك سەری هەلدا ، لەهەموان توند تر توخمی ئاری بوو بە ئاڕستەیەکی پیشڕەوی میلەتان لەسەر بنچینەی رەگەز نەك ئایدیۆلۆجیا ڕۆیشتن ، هیگڵ پێی وابوو کە واهاتووە هەرجارەی نەتەوەیەك پێشڕەو بووە، ئێستاش نەتەوەی ئەڵمانیا پێشڕەون و گەیشتوونە لوتکەی گەشەسەندن، بۆیە نەتەوەی ئەڵمانیا دەبێ ببێتە سەرکردەی جیهان و ئیدی ئەو بانگێشەی ئاریەتی و پاکێتی توخم و نازیەت[310] و جەنگی جیهانی لێ هاتەدی، جینۆساید وکارەساتی لیهاتە دی، لەزۆر لای تر ئەو بانگیشەیەی قەتیس کردنەوەی پیشڕەوی بۆ میلەتیك جاڕدرا ، شۆڤینی فرنسی وفالانژیسی ئیسپانی و نازی ئەلمانی وفاشی ئیتالی وتۆرانی تورکی وبەعسیەتی عربی لە چوارچیوەی ئەو بانگیشەیەوە سەری هەلدا .

لەلای ئاینیش بە قوول تر و بە چەمکی جیاتر باسی ئەو بابەتە کراوە ، هەڵبەتەپەیام پێشڕەوی بەشەریەتە هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆمەڵگەش دەمێنێ هەر پێشڕەوە، ،هەر لێرەوەش بناغە فەلسەفیەکانی هاتنی پێغەمبەران بۆ کۆمەڵگە ڕوون دەبێتەوەکە زۆر پەیوەندیدارە بە فاکتەرەکانی گەشەو پیشڕەوی ، لە قورئان بەو جۆرە گوزارش لە پیشڕەوی کراوە (وکژلك جعلناكم امه وسگا لتکونوا شهداو علی الناس ویکون الرسول علیکم شهیدا .. سوره البقره- ایه 143) ، تویژینەوە ئەکادیمیە نوێیەکانیش وای دەردەخەن پیغمبەران و بانگیشە ئاینیەکان پیشڕەوی دیزاینی ژیانی مرۆڤایەتی بووینە ، تەنانەت شارستانیەکانی کۆنیش لە بەرهەمی ئەوانن ، هەندێ نمونە باڵا هەلدەبژێرین بۆ ساغکردنەوەی ئەو تیۆرە:

1-ئەسلی بیرۆکەی زانستی وفلسفی گەردونی کۆن ناگەریتەوە بۆ تالیس و ئەنکسامیندەر یان بۆ ئەرستۆ

---

[310] National so zialis Tishe Deutsche Arbeieer parteiنازی کورت کراوەیNazi لە وەرگێڕانی (نازی-لە پیتەکانی یەکەمی پارتی سوشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانیا-naze) هاتوە .

وەك ئەبو حامد الغزالی دەلیت[311] ،بەلکو بۆبتلیمۆس(مەجەستی)کە لە ئەسکەندەریە بوە[312]،لەویش لە سومەریەکان هاتوە ،لەویش لە مەزمورەکانی داودپیغمبەر هاتوە[313]،زیاتر لەوە ئەگەر بەووردی سەرنج بدەیە ئنجیلی برنابا وئەو ئایەتە: ( انه مکتوب هناك کیف ان سماء السموات تسعه ، لأن الهنا غیر محدود ، 12 فقال الکاهن :" هکذا قال سلیمان النبي یا یسوع)[314] دەردەکەوێ لە بنەچەدا بیری گەردوونیان لە ح سلیمان وەرگرتبێ کە لەتەورات وکتیبە کۆنەکان هاتوە ،

2- ناسنامەی ئاینی مەدرەسە فلسفی وزانستیەکانی یۆنانی کۆن : سپینوزا دەلێ سلیمان بە حکیم ترین مرۆڤی سەر زەوی وەسف کراوە[315]، فیساگورس قوتابی ح سلیمان بوە، ،ویل دیورانت لە پیشەکی کتیبەگەورەکەی (قصة الحضارة)بەو دەقانە دەستی پیکردوە :(" تراثنا الحدیث" وفیه تاریخ الاختراع والسیاسة والعلم والفلسفة والدین والأخلاق والأدب والفن في أوربا منذ تولی نابلیون الحکم إلی عصرنا الحاضر،

إن قصتنا تبدأ بالشرق، لا لأن آسیا کانت مسرحاً لأقدم مدنیّة معروفة لنا فحسب، بل کذلك لأن تلك المدنیات کونت البطانة والأساس للثقافة الیونانیة والرومانیة)[316]،براتراند راسل دەلێ فلسفەو زانست لەلای دەریای سپیەوە بەرەو ئەوروپا هاتوە، هەروەك تالیس وئەفلاتون وهیرۆدۆت ووتویانە زانستەکانی بیرکاری وفەلەك وئاینی لە رۆژهەلات بۆ رۆژ ئاوا هاتوە[317]، ،(المقدسی) دەلێ باپیرانی ئەفلاتون لە پیغەمبەرانن( وأما الحرانیة فإنهم یقولون لن تحصی أسماء الرسل الذین دعوا إلی الله وان

---

[23] بە پیی پەراویزی ص15تهافت الفلسفه ئەوا ئەرستۆ بۆ یەکەم جار لە کتیبی(السماو والعالم) ووتی جیهان ئەبەدی وئەزەلیە،بەلام واپێدەچی زۆر پێش ئەو بۆچوونە هەبووبێ ، لەزەبوورو تەورات ئاماژەی وای تیدایە.

[312] ئەسلی بتلیمۆس میسری کۆنە،کتیبەکەی (مەجەستی) هەندی جار بە (الأطروحة الکبری) ترجمە کراوە ،بەلام زیاتر بە(ترتیب)ترجمە کراوە .

[313]لەمەزموری ژ:78 دەلێ: (کالأرض اسسها الی الأبد ) .

[314]ئینجیل برنابا– فصل 95 ئایةتةکانی 11–12 .

[315] سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسة ،ترجمة:د حسن حنفی،دارالطباعة–بیروت،ط1 ص145.

[316] *ویل دیورانت-قصة الحضارة- ج1ص9*.

[317]علم الإجتماع ص141.

مشهورهم أراني واغثا وذيمون وهرمس وسولن جد أفلاطن لأمه)[318] ، هەریەکە لە ئەنباکلیدس و فیساگورس (581- 497 پ ز) لە سەر دەستی پیغەمبەران (ح داود و ح سلیمان )دەرسیان خویندووە[319]، پالپشت بەوە کتیبی (فکر الشرق القدیم )توانیویەتی بلّیٚ یەکەم جار ئەرستۆ دانی بەوە نا کە فلسفەی سروشتی لە تالیس وەرگیراوە ئەویش لەسەدەی 6ی پ ز لە رۆژهەلاتی وەریگرتوە[320] ، بوکراتی حەکیمی گەورەی یۆنان قوتابی لوقمانی حەکیم بوە[321]،ابن خلدون وای ڕیٚز کردوە: ئەرستۆ قوتابی ئەفلاتونە،ئەویش قوتابی سوکرات،ئەویش قوتابی فیساگۆرس ،فیساگۆرسیش قوتابی تالیس بوە ،تالیس فلسفەی لە لوقمان وەرگرتوە[322]، لە قورئانیش ئاماژە بە لوقمان دەدا کە حیکمەت وفلسفەی بە پەیام بۆ هاتوە ،لوقمان کتابی بۆ نەهاتوە تەنها حیکمەی بۆ هاتوە (ولقد اتينا لقمان الحكمة ..سورة لقمان اية 12) ،لە(طبقات الامم) دەلیٚت یەکەم فەیلەسوفی یۆنان (ئەمباقلیدس)زانستی لە(لوقمان)وەرگرتوە[323]،زیاتر لەوە لەکۆنەوە بەشیٚك پیٚیان وابوە فەیلە سوفە ئاینیەکانی یۆنان پیغمبەر بووینە هەروەك المقدسی دەلیٚت:(ومن القدماء من يقول بنبوة افلاطن

---

[318] البدء والتاريخ ص150.

[32] بروانة : الملل والنحل ..ص 67- 72 لە رۆژئاوا ناوی داود بە(دیڤید) دیت وتا ئیستاش ئەوناوانە باون. لە (طبقات الأمم- الصاعدى الأندلسى) زیاتر باسی لە پەیوەندی ح سلیمان و فیساگۆرس کردوە .

[320]جون كولر- الفكر الشرقي القديم - ترجمة :كامل يوسف حسين مراجعة :د .إمام عبدالفتاح إمام ص7

[321] ابن خلدون-مقدمه ص480 دەقەکەی وا هاتوە: واتصل فيها سند تعليمهم على ما يزعمون من لدن لقمان الحكيم في تلميذه بقراط الدن ثم إلى تلميذه أفلاطون ثم إلى تلميذه أرسطو ثم إلى تلميذه الإسكندر الأفردوسي وتامسيطون وغيرهم ).

[322] تاريخ ابن خلدون ج2 ص222دەقەکەی ئاوا هاتوە( ..ومعلمه أرسطو هذا من اليونانيين، وكان مسكنه أثينا، وكان كبير حكماء الخليقة غير منازع. أخذ الحكمة عن أفلاطون اليوناني. كان يعلم الحكمة وهو ماش تحت الرواق المظلل له من حر الشمس، فسمى تلاميذه بالمشائين، وأخذ أفلاطون عن سقراط، ويعرف بسقراط الدن بسكناه في دن من الخزف اتخذه لرهبانيته وقتله قومه أهل يونان مسموماً لما نهاهم عن عبادة الأوثان. وكان هو أخذ الحكمة عن فيثاغورس منهم. ويقال: أنّ فيثاغورس أخذ عن تاليس حكيم ملطية، وأخذ تاليس عن لقمان-.. )

[323] الصاعدى الأندلسى- طبقات الأمم ص21 .

وسقراط وارسطاطاليس وهولاء يقولون النبوة علم وعمل)[324].

3-بیری فلسفی چوار توخمه بنچینەیەکە(ئاوو وهەواوا ئاگروگڵ) کە تەواوی فلسفەی یۆنانی وجیهانی تەنیبۆوە،زیاتر دەدریتە پاڵ ئەنپادیکلیس(495-435 ق م)[325] ئەسلەکەی رۆژهەلاتیە،لە ئاینی زەردەشتی بە ڕوونی هاتوە ، هەتا نیشانەی (+) نازیایەتی کە بە ئەڵمانی پێی دەوترا (سواستکا ) ئەوە نیشانەی ( خاچ ) نەبوو، بەلکوو هیمایەکە میللەتانی پێشووی زەردەشتی ودوای مەغۆل و جەرمانی کۆن و هەتا هیندی سوورەکانیش هەڵیانگرتووە[326]، گوزارش لەو چوار توخمەکە دەکا،(مەسحەفی رەشی) ئیزیدیانیش باسی ئەو چوار توخمە وا کردوە:(خوا دابەزیە قودس فەرمانی بە جوبرائیلدا کەمیك خۆڵ وهەواو ئاگرو ئاوی تیکەل کردئادەمی لێ دروست کرد-عەرەبیەکەی– أمر جبرائيل جلب تراب من أربع زوايا الدنيا فجاء بتراب وهواء ونار وماء فخلق من كل هذا آدم الأول)[327] .

4-بناغەی ئیمپراتۆریەتی رۆم هەروا لە باپیرە گەورەیان کە ناوی (روم بن عيسو بن اسحاق النبی )[328]،

5-شریعەتی حەمورابی درێژ کراوەی شریعەتی ح ئیبراهیمە ،بە پێی (پەیمانگای ئیسلامی بریتانی – زانستەکانی بەراوردی ئاینی )ئەوا حەمورابی 300 ساڵ دوای ح ئیبراهیم هاتوە لە 1870 پ ز ،بۆیەش بەشی زۆری مادەکانی شریعەتی حەمورابی لەتەورات و ئینجیل وشریعەتی ح ئیبراهیم وهەندێکیشی لە ئاڤیستای زەردەشتی دەچێ ، هەندێکی لەگەل قورئانیش لێك نزیکە.

6-رۆژهەلات وعەجەم وفارس لەو کاتی زانیاری وئاینیان ناردوە بۆ رۆژئاوا، کە دەلین فارس ئاگر پەرست بووینە نەك خوا پەرست واپیدەچی وانەبێ (ابن مسکویه)دەڵێت:( وأفريذون أوّل من تسمّى ب « كي ». فكان يقال له: كي أفريذون، وهي كلمة تعنى التنزيه، أي: روحاني، أي: هو منزّه متصل

---

[324] المطهر بن طاهر المقدسي- البدء والتاريخ ص150.

[325] الفلسفة والفيزياء– ج1 ص44.

[326] مەوسوعەی جودی - مادە :نازی

[327] ئەنستانس ماری کەرمەلی-کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل79 ئایەتی 17 لە مەسحەفێ ڕەش.

[328] بروانة : لسان العرب –ابن المنظور ج1ص1260 مادة: روم .

بالروحانية. وكان جسيما وسيما حسن البهاء، محربا عظيم القوة)[329]، زۆربەی زانیاریەکانی ئەو سەردەمەش ڕەگیکی کۆنی هەیە کە لەویشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاینە کۆنەکان،د

7-لەبارەی ئەسلی زانستەکان : دەگۆتریێ کۆپەرنیك وگالیلۆ یەکەم جاردۆزیانەوە کە زەوی بەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە نەك ئاسمان ، کەچی ئەوەش زانیاری کۆن وئاینی لە پشتە، یاقوت حموی دەلی: (وقال قوم الأرض تهوي إلى ما لا نهاية له والسماء ترتفع إلى ما لا نهاية له. وقال قوم إن الذي يرى من دورانا لكواكب إنما هو دور الأرض لا دور الفلك)[330]،مەقدیسی هەمان ڕاستی دەڵێ بەشێك لە زانایان پێیان وابوە وادەردەکەوێ کە ڕۆژومانگ وئەستێرەکان بەدەوری زەوی بسوڕێنەوە کەچی زەویە بەدەوری خۆی دەسوڕێتەوە [331]، لەکۆنەوە ئەو زانیاریە هەبوە ،(لارستارخۆس)لە270 ق م تیۆریکی وەك کۆپەرنیکی گەلالە کرد[332] ، تالیس سالی بە 365 رۆژ داناوەو لە 585ی (پ ز)پیشبینی رۆژ گیرانی کردوە[333]،ئاریستاگۆریس لە سەدەی (3)ی بەر لە زاین زانیویەتی کە زەوی چەقی گەردوون نیەو خۆر زۆر لەزەوی گەورەترە ،فیساگۆرس ووتی زەوی بەدەوری ئاگریك دەسوڕێتەوە[334]، شیشرۆن لە لارستاخۆرسی(310-230 پ ز) وەرگرتوە دەلێ ئەو پێی وابوو رۆژ ناجولێ بەلکو زەوی بەدەوری دەسوڕێ ،ئەلبیرۆنی لە973 ز زانیویەتی زەوی خڕەو نیوەتیرەشی دۆزیتەوە،،بەپێی هەندێ سەرچاوە ی تر(قەزوینی ) پیش کۆپەرنیکۆس باسی سوڕانی زەوی کردوە[335].

8-ئەسلی دیموکراسی لە بنەما ئاینیەکان هاتوە ، ئەمبادیقلس بە باوکی دیموکراسی وەسف دەکرێ ،ئەویش قوتابی (ح داود) بوە .

9- سیستەمی ژمارەی (دەیی) کە لەهەمو جیهان کاری پێدەکرێ ئەسلەکەی هندیە،...

---

[329] ابن مسكوية- تجارب الامم ج1 ص18

[330]ياقوت حموى –معجم البلدان ج1 ص2.

[331] المطهرى بن طاهر المقدسى- البدء والتأريخ ص 78 .

[35] مادلر- تاريخ علم الفلك ص44 .

[333] فريدريك انجلس- ديالكتيك الطبيعة ص217، ص213

[334]ديالكتيك الطبيعة ص214

[335]بروانة: صورة الأرض- احمدعلامة،دارالفتى العربى للنشر ص36

له سەر ئەو بنچینە قوولّانە( ڕۆسۆ) دەلّێت یەکەم دەسەلاّت وشارستانی ئاینی بوە[336]، لێرەش پالپشتیکی ئاینیە کە بتوانن بلّێن پیشڕەوی زانست وفلسفەو گەردووناسی و شارستانیەکان ئاینی بوە .

10- بەلگەی تر زۆرن کەسەرچاوەی شارستانی ئەوروپیش زۆربەی رۆژهەلاتیە ،تەنانەت زاراوەی (ئەرسنال)ی ئەوروپی لە (دارالصناعە)ی شارستانی ئیسلامی هاتوە ،یەکەم جارلە ئیتالیا (دارسفن) بوە دارسنا چوە ئیسپانیا بوە ئەرسنال بەو ناوە چوە هەمو ئەوروپا[337] .

---

[336] جان جاك رؤسؤ- العقد الإجتماعى- ص201 .

[337] دائرة معارف اسلامية ص4828 .

(10)

# گەندەلی الفساد Corruption

ئەوانەش دەگریتەوە (پلۆتارخی - من این لك هذا – شەفافیەت- میریتۆکراسی-کلیپتۆکراسی – کلیپتۆمانی ،وصولی ،نیپۆتیزم ، 17ی شوبات- هیزی ئارێارِ - حکومە الرشیدە- الحوکمە – تکنۆکرات،نۆمۆکراسی،دوله الرخوە،مدینة الفاضلة،وثیقة السوداء..

ئەگەرچی ڕەهەندی ئەو زاراوە کۆنەو جیهانیە بەلام وەك زاراوە کوردیە، لە ئەنجامی ئەزمونی حوکمڕانی کوردستان(وەك چەمکێکی ئابووری وسیاسی)لە سەرەتای سەدەی 21سەری هەلدا، هۆکارێکە بۆ گەشەنەکردن ودروست بوونی هەژاری ونادادگەری، ئەو زاراوەیە لەسەردەمی شۆڕش دەرنەکەوتوە وەك هەندێك دەیانەوێ ڕیشەکەی بۆ ئەو سەردەم بگێڕنەوە، لەکوردی بەو سیستەم وتەن وکەرەستانە دەووترێ گەندەل بوە مانای بەرگەی مانەوەی نەماوە، بۆگەن بوە ،عادەتەن ئەو مادانە گەندەل وبۆگەن دەبن کە پیکهاتەیە لەچەند توخمێك ،یەك توخمی گەندەل نابێت، لە زانستی مرۆیی پێچەوانەی خۆ نەویستی و(زوهدە) ، وەك چەمك هاوتای هەیە لە ئەنسیکلۆبیدیاو کتیبەکان بە هەمو زمانەکان ماناسادەکەی دژبە یاساو ئەخلاق وبەرژەوەندی گشتیەکان گوزارش کراوەبە ئینگلیزی (Corruption)یان(communuy)،بەفرنسیەکەی(communue)بەلاتینیەکی communutia)، (گەندەلی(الفساد) لە قاموسە عربیەکان بەپیچەوانەی چاکسازی (اصلاح)هاتوە ، هەر ناوی چاکسازی بیت ناوی ئەو چاکسازیەی (مارتن لوسەر 1483-1546) دێت لە دژی (کاتۆلیك، دادگاکانیان، کلیل و چەکی بەهەشت، پشکنین، دەرەبەگایەتی، گەندەڵی،..)، کەهەمویان سەرچاوەکەی گەندەلیە ،حکومەتی گەندەل و بەدکاری لێدروست دەبیت (Bad Governance -الحکم الفاسد.)،ئەگەر زۆر سەخت بوو پیشی دەووترێت( دوله الرخوە - the soft state) ئەو وولاتانەی جیهانی سێیەمن کە گەندەلی زۆر بلاوەو یاسا سەروەر نیە وبەرژەوەندی کەسی زالە ودامەزراوەیی نیە

تی[338]، پیچەوانەی حکومەتی نایاب(حکومە الرشیدە- Good government ) زیاتر لەوە فارابی لەهەردوو کتیبی(اراء اهل مدینة الفاضلة) وکتیبە(السیاسە المدنیە) بەرامبەر حکومە الرشیدە چەندین حکومەتی ڕێزکردوە :حکومە الجاهلە-حکومە الفاسقە-حکومە متبدلە-حکومة ضالة) ،دەشلێ حکومەتی رەشیدە بە سەرۆکی رەشیدە دێتە دی کە لە ئەنجامی سەروەری یاساو لێکجیاکردنەوەی دەسەلاتەکان وشەفافانە دیتەدی ،دیویکی زاراوەی (الحوکمە - CORPORATE GOVERNANCE) مانای بەرجەستەی حکومەتی نایاب یان وەك دەقی عربیەکەی: ا( أسلوب ممارسة سلطات الإدارة الرشیدة ) دوور لەگەندەلی،لەهەموی دەبێت حکومەتی یاسا بێت کە بە(نۆمۆکراسی)ناوزەد دەکرێت بەمانای :حکومە القانون او دولە القانون —اوحکم القانون ) ، جاران زاراوەیەکی تر هەبوو هاوتای حکومەتی نایاب،ئەویش تکنۆکراتی(technocrcy) بوو بەمانای دەسەلاتی تەکنیکاران ،ئەو زاراوەیە لەگەل شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپا زیاتر سەری هەلدا بەووردتر لە سالی 1932لە ئەمریکالەلایەن کۆمەلێك تەکنیکاری ئەندازیاری وئابووریناس دارڕژرا،واتە حکومەتیکی پسپۆری وشارەزا،حکومەتی باش ،پیشوو تریش لە (**مدینة الفاضلة** )داوای کردبوو فەیلسوفان حوکمداربن) ،لە سالی 1919 جاریکی ترلەسەر دەستی (ولیام هنری سمیت) داوای ئەو جۆرە حوکمەی کرد بۆ کۆمەلگەیەکی مەدەنی ، زاراوەی ئەریستۆکراسیش جاروایە هەمان مانای داوە ، چونکە ئەریستۆن لە ئەگریکی مانای (احسن)بوە، واتە حکومەتی نایاب .

زۆربەی پیغمبەران حکومەتی نایابیان لەناو کۆمەلگەیەکی گەندەل دروست کردوە ،لە نمونەی هەرە زەقی پیغمبەران دژ بەگەندەلی شوعەیب بوە لە ناوچەی شام ومیسر شوینیکی بازرگانی بوە ، پڕ بوە لە گەندەلی بە پێوان وقۆرخ کردن ودزی لە ئال وگۆڕی وهەلخەلەتاندن و چینیکی کلیپتۆکراسی دروست ببوو ،ئەوەی لوت پیغمبەریش جۆرە گەندەلیەکی تربوە .. ، جاریکی تر حکومەتی نایاب لەسەردەمی پیغمبەرەکانی تر و جینشینەکانیان هاتۆتە دی ، بۆیەش بەشیك ناونراون (خلافە

---

[338] معجم مصطلحات عصر العولمة ص239

الراشيده)كه حكومەتی (رشيده)ی بەرپا كردوه ،بەبەكارهينانی گەورەترين ئامرازی دژ بە گەندەلی (**من اين لك هذا** – ئەوەت لە كێ بوو؟) ، لە قورئان بە توندی سەرزەنشتی گەندەلی كردوه (..ولا تبغ الفسادفي الأرض إن الله لا يحب المفسدين القصص : 77 )لە 50 شوێن باسی كردوه ، لە (كتاب المقدس) لەهەردوو بەشی (عهدالقديم )و(عهدالجديد) بەتوندی سەرزەنشتيان كردوه (لان الظلم يحمق الحكيم والعطية تفسد القلب- جا 7: 7 ) لة شوينيكی تر: (وقال ايها الممتلئ كل غش وكل خبث يا ابن ابليس يا عدو كل بر الا تزال تفسد سبل الله المستقيمة- اع 13: 10).

بەو شێوەيە يەكيكە لەوزاراوانەی كە هەمو لايەك پێيان وايە سەلبيەو بريتيە لەبەكارهێنانی دەسەلات بۆ بەرژەوەندی تايبەتی ، كۆمەلێك ڕيكەوتنامەی دەولی بۆ مۆركراوە ،..دوای ئاستی ريكەوتنامەكان لە شێوەی چەكيكی دەولی لەلايەن نەتەوە يەكگرتوەكان كرا ياسای دەولی لە 31ی ئۆكتۆبەری 2003 ،ژمارەی بڕيار:58/4 پيكهاتوە لە 71مادە ، هەر بۆيەش كەمتر جياوازی لەبارەی بۆچوون وپيناسی هەيە ، هەنديكی لێهەلدەبژێرين :

+هەمو ئاينێك پێی وايە ئەوەی حەرامە لەهەمان كات ڕێگەی گەندەلیة ( فما أمر الله تعالى بشيء إلا وفيه مصلحة عاجلة أو آجلة أو كلاهما، وما نهى عن شيء إلا وفيه مفسدة عاجلة أو آجلة أو كلاهما)[339] .

+ ڕيكخراوی شەفافيەتی نيودەولەتی : خراپ بەكارهێنانی دەسەلات لە پيناو بەرژەوەندی تايبەت . لە دوا ڕپۆرتی 2016 پيناسەكە فراوان كرابوو بە(خراپ بەكارهێنانی دەسەلات لە پيناو بەرژەوەندی كەمايەتيەك وزيانی زۆرايەتی ) .

+ تقرير التنمية في العالم : استخدام الوظيفة العمومية لتحقيق مكاسب شخصية [340].

+ (دائيرەی معارف): گەندەلی بە دژی چاكساز هاتوە، يان دژی پاكی[341] .

---

[339] القواعد الصغرى ( مختصر الفوائد في أحكام المقاصد) - عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام ص199.

[340] تقرير التنمية في العالم-1996م ص 124.

+قاموسی ئۆکسفۆرد: به وێرانکەری دەست پاکی هاتوه.

+الموسوعة العربية العالمية : ممارسات الفساد هى أساليب غير قانونية يلجأ إليها السياسيون لكسب امتيازات سياسية عند الانتخاب. وتوجد في كثير من البلدان تشريعات تضبط الحملات الانتخابية والانتخابات. وتحرم هذه القوانين أعمالاً غير قانونية مثل الرشوة، وحشو صندوق الاقتراع السري، والتلاعب بآلات التصويت، وتهديد الناخبين أو مُمَثِّليهم.[342]

+الموسوعة الميسرة:الفسادالحكومى فسادسياسي هو المخالفات وانحراف..[343]

+الموسوعة الاسلامية: خروج الشيء من حال الوجودالى حالة العدم[344] .

+ قاموس الكتاب المقدس_ الرشوة هي ما يعطي لقضاء مصلحة، أو ما يعطي لإحقاق باطل أو إبطال حق، وقد ذكرت كثيرًا في العهد القديم، وكانت تستخدم لتعويج القضاء، لإدانة بريئ (مز 15: 5، إش 5: 23)، أو لتبرئة مذنب (إش 5: 23) ، أو لقتل بريئ (تث 27: 25، حز 22: 12)[345]
. +کتێبی (الذهب والدولار): پێی وایە سەرچاوەی هەمو گەندەلیەك لە جم وجۆلی لایەنی ئابووری زایۆنی هاتوە[346] .

+ قاموس المصطلحات الاقتصادية فى الحضارة الاسلامية :گەندەلی بەشێکە لە چەمکیکی قورئانی فراوانتر (باطل).

---

[341] محمد فريد وجدى – دائرة معارف قرن عشرين ج7ص286 هەمان پێناس لە(لسان العرب ج3ص335.) هاتوة .

[342] الموسوعة العربية العالمية :المادة: ممارسات الفساد .

[343] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ص315

[344] الموسوعة الاسلامية العامة -اشراف: ا د محمودزقزوق ،قاهرة 2003 ص1080

[345] قاموس الكتاب المقدس | دائرة المعارف الكتابية المسيحية (مادة: الرشوة) .

[346] (الذهب والدولار) ولعبة الأسهم وعلاقةالصهيونية بانهيار العالم - كتێبیکی 160 بپەرەیی محمدشریف مڤلوم

+ **بابا شنودة الثالث:** دەلێ گەندەلی پیگەی مرۆڤ لە کوڕی خوداوە دەکاتە کوڕی شەیتان[347].

هەندیکی تر دەیبەستنەوە بە سودوەرگرتنی ناراستەوخۆی بۆ دوو چینی تر یەکەمیان خزم وکەسە نزیکەکانی خۆی ، بەزمانی ئیتالی بەو پرۆسەیە دەوتری ( نیپۆتیزم) مانای ئامۆزاچیەتی ،بە ئامۆزا دەگۆترێ واتە دەسەلاتی خزم خزمینە .دوەمیان بۆئەوەی ودەستەو تاقمی تایبەتی خۆی پیدروست دەکات، ئەو پرۆسەیە پێی دەووترێت ( **المحسوبية** Clientelism ) کە دەسەلاتدارانی گەندەلچی دەیکەن بۆ ئەوانەی لایەنگرینە لە ڕێی دام ودەزگای حکومی ، جاریش وایە یاساو دادگا وئاسایشیشی بۆ دەڕەخسێنن .ئەو بەشەش پێیان دەووترێ (الوصوليە Accessibility) زاراوەیەکی فرنسیە وەك دەردێکی دەروونی جۆرە مرۆڤێکێکە کە هەلس وکەوتیان وایە هەمو ئامانجیان لە کارە چاك وخراپەکانی ئەوەیە بگەنە پۆستێکی بالا بەهەر نرخێك بێت،یان وەك (الموسوعة الحديثة للمصطلحات) دەلێت بەمانای (حب الرفعه)[348] ،جاریش وایە (ئەنانیان)پێ دەووترێ لە مەیدانی پیاوانی حکومەت .

ڕەهەندو جۆرەکانی گەندەلی:

زۆر جۆرە گەندەلی هەیە (سیاسی،قەزایی،یاسایی،کۆمەلایەتی..) لەکوردستان گەندەلی تەندروستیش هەیە کە بەدەگمەن لە شوێنانی تر هەیە ، بە هۆی ئەوەی گەندەلی لە دیکتاتۆری وتۆتالیریاتی وحزبایەتی بێبنەماو دەستگۆڕی نەکردنی دەسەلات نزیکە وەك (مونتیسیکۆ) دەلی گەندەلی وتۆتالیریتی هاوڕێن، بۆیە بەشی هەرە زۆری قەبارەی گەندەلی لە وولاتانی عربی کۆبوویتەوە ،لەو جۆرە دەسەلاتانە ڕیخۆش دەکەن گەندەلی بەرامبەر لایەنگری دەسەلات وسەرۆك وەك سەودابەردەوام بیت ، لە جیهانیشدا گەندەلی بە ڕێژەی جیاجیا هەیە سێ ئاست وپۆلینی سەرەکیە :1- چەند کەسانیك لە پەنا حکومەت گەندەلی دەکەن و بەرتیل وەردەگرن بە نهینی 2- جار وایە حکومەت

---

[347] كتاب حياة التوبة و( 26– الخطية فساد للطبيعة البشرية)

[348] الموسوعة الحديثة للمصطلحاتالسياسيەوالاقتصاديە ص154

خۆی لە پشت گەندەلی بوەو چینیکی دەسەلاتداری دەولەمەندی لیدروست بوەو زاراوەی (بلوتارخی- بە ئەلمانی) بۆداتاشراوە بە مانای حکومەتی دەولەمەندان[349]، زەق ترین نمونە ئەو دەسەلاتەیە کە لە سەدەی 18 هاتوە وناونراوە (بەلگەنامە ڕەشەکە- وثیقة السوداء) کەلەلایەن چەند راویژکاریك وارێککەوتن دەسەلاتەکەیان لە پیناو دەولەمەندی خۆیان بیت ، لەکۆنەوە بەو جۆرە حوکمە ووتراوە (پلۆتۆکراسی)کە حوکم لە دەست ساماندااران بوایە دژ بە هەژار ،لەو جۆرە حوکمە بەرتیل و گەندەلی ڕەوایەتی پێدەردرێ تا ڕادەی دزی کردنیش لە میلەت لە ڕێی دام ودەزگای حکومی ،لە ڕاستیدا دزی وسوو وگەندەلی لێکجیان بەلام بەشێك دەلێن یەك سەرچاوەیە،مەرج نیە هەمو دەولەمەندێك دزی وگەندەلی بێت کەچی (سان جیرۆم)ی پاپای نەساریەکان لە 420 ز ووتویەتی دەولەمەندی دزیە یان خۆی یان باپیرانی کردوویەتی[350]، لەو سەردەمەش پرۆدۆن دوبارەی کردۆتەوەو دەلیّ(الملکیە هی سرقە) مارکسیش خەریکە وابلێ، غاندیش ڕای وایە ئەو مولکیە زیادەی لە پیویستی خۆت دزی وگەندەلیە، ئەوەیان جیایە لەگەل چینی برجوازی و تکنوکرات کە لە ئەنجامی نادادگەری سیستەمی سەرمایەداری دروست دەبیت 3- بەشیکی تر لەگەندەلی ئەوەیە حکومەت ڕاستەوخۆ گەندەلە ، ئەوەیان ترۆکی گەندەلیە(فساد منظم)،وەك (ح مسیح) ووتویەتی ( **أنتم ملح الأرض، ولكن إن فسد الملح فبماذا يملح؟!**)[351].

لەبنەچەدا کاری بنچینەیی دەولّەت ئەوەیە سەروو سامان ومولکیەتی گشتی بپارێزێ لەدەست ئەو هەلمەتانەی مولّکیەتی تایبەتی، چونکە مولّکیەو بەرژەوەندی گشتی لەژێر هەڕەشەی ئەو هەلمەتانەن، ئیتر دەولەت وحکومەت کاری ئەوەیە بەرژەوەندی گشتی و سامانی گشتی بپارێزێ ، کاتێ دەسەلاّت دەبێتە گەندەلّ ئەگەر ببێتە بەشێك لەو هەڕشەیە، نەرم ترین زاراوە بۆ حکومەت وا ووشەی"حکومەتی چینایەتی"یە ،کە جۆرە حکومەتێکی (فاشل)ەو گەندەلی منهج دەبێت وزال دەبێت بەسەر باقی چالاکیەکان، ئەوانەهەر هەموی هیشتا گەندەلی کردنە لە پەنا حکومەت

---

[349] بۆ مانای پلۆتارخی بڕوانە: القاموس السياسي –احمدعطية الله ط3ص214

[350] محمدفريد وجدى –دائرة معارف الإسلامية ج5ص382

[351] كتاب المقدس - (مت5: 13) .

،خراترینیان ئەوەیە حکومەت خۆی گەندەلی بکا بە هۆی حکومەت، پێی ووتراوە حکومەتی مافیا، یان جاروایە لەوەش خراتر زاراوەیەکی تری پیویستە بۆ گوزارش کردنی ، پیی ووتراوە (کلپتۆکراتی) (Kleptocracy ) (حکم اللصوص) کەلە دوو وشەی یۆنانی کۆن هاتوە(κλέπτης )مانای دز (κράτος ) مانای حوکم ، ئەو جۆرە گەندەلیە ڕاستەوخۆ بۆ چینی دەسەلاتدارانە[352]،ئەگەر دزەکە تاك بێت زاراوەی (کلیتۆمانی-واتە جەنەی دزی)بۆ دیاری کراوە ، لە(فەرهەنگە ئینگلیزیەکان )دەلێت لە بنەچەدا (کلیپتۆکراتی) جاریکی تر بە حوکمی ئیسپانیای 1819 ووتراوە .نمونەی نویش زائیر (مۆبۆتۆسیسی سیکۆ) ئەفریقای ناوەڕاست (جان بیدل بۆکاسا).. ، لەبەرامبەر کلیپتۆکراسی زاراوەی میریتۆکراسی هەیە واتە حکومەتی شایستەولێهاتو،بنەمای ( خەلکی شایستە لەشوینی شایستە)پەیرەو دەکا،ئەو زاراوەیە بەپێی(فەرهەنگی سیاسی ئارشی فارسی )یەکەم جار لەلایەن مایکل پانگ لەکتیبی(سەبارەت بە میریتۆکراسی 1908)هاتوە[353] ، میریت لە ئیینگلیزی بەمانای شایستەو بە توانا ،میریتۆکراسی واتە حکومەتی بە توانا .

لەو سەردەمە لە وولاتانی عربی (بەتایبەتی وولاتانی نەوتی) بەدی دەکرێ کە شوڕش وبوهاری عربی بەسەرهاتوە ،لەو دۆخانە یاساو تەواوی دام ودەزگا لە پیناوی دزیەکە دەبیت،چەسپاوو هێلی سورئەو بەرژەوەندیەیە نەك بەرژەوەندی گشتی ونیشتمان و..، جاریش وایە هەمو پرۆژەیەکی خزمەتگوزاریش پالنەرەکەی دزینی ئەو سامانانەیە ، لە کۆتایی داهاتی وولات بۆ چینێکی دەسەلاتداری کەمایەتی (ئۆلیگارچی) دەبێت ، چینی دوەم ئەوانەی لەدەوری ئەوانەن ..بەو شێوەیە کۆمەلگەیەکی چینایەتی پلەیەك ودوو تا دەگاتە چینە هەژارە فراوانەکە دروست دەبیت ،ئەگەر چی کارل مارکس لە کتیبی (راس المال) پێی وابوە چینایەتی تەنها لە ئەنجامی پرۆسەی بەرهەمی سیستەمی سەرمایەداری دروست دەبیت ،کەچی دروست بوونی چینایەتی بە هۆی گەندەلی حکومی(کلیپتۆکراسی) زۆر خیراترو توند ترە لەوەی مارکسیەت .

---

[352] بڕوانە: موسوعە المعرفە – مادە: الکلیبتوکراتیە . هەروەها موسوعة البریطانیة ، هەروەها (free Dictionery) .

[353] فەرهەنگی سیاسی ئارشی فارسی ل668

ریکخراوی شەفافیەتی نیودەولەتی سالانە بە هۆی هەندێ پیوەر (لەوانە ریژەی سەدی)لیستی چەندین وولات بلاودەکاتەوە لە گەندەلی دەگاتە نزیکەی 150وولات بە جۆراوجۆر، ڕاپۆرتی سالی 2013 گەیشتۆتە 177 دەولەت، هۆگیت لاپیلی سەرۆکی شەفافیەتی جیهانی دەلیٚ گەندەلی بە شیوەی جیاجیا ڕووی لەهەمو جیهان کردوە خراپترینیان سۆمال وئەفغانستان وکۆریا بوەکە 8٪یان هینا بوو ، چاکترینیشیان وولاتی ئەسکندنافیا لە پیش جیهانن بۆ پاکی 91٪یان هینابوو ،لەسالی 2014 دووبارە بوویەوە بەهەمان ئەنجام ئەوجارەیان نیوزلەنداش هاتە ریزی پیشەوەو سەنگافوراش لە ئاسیا یەکەم بوو ،لەبەرامبەریش عیراق هاتە ریزی پیشەوەی گەندەلی لەگەل ئەفغانستان وسۆمال و..، ،شاعیریکی ئەمریکی پیێی وایە هۆکاری گەندەلی دیموکراسیە(کەلە تاریخ فلسفه الامریکیه وەرگیراوە)دەلیێت ئەی دیموکراسی چۆن هەمو دنیات گەندەل کردوە: ایتها العاهره القادمه من عصور الفاسده ..ومن نشأه خاسره...خیر لك ان تشعری بالقیودمن ان تفسدی العالم اجمع ...[354] ، لە سالی 2004 ریکخراوی شەفافیەت (بارەگای لە ئەلمانیا) لیستیکی گەندەلی سەرۆك وپاشاکان بلاو کردەوە بۆ ئەوانەی مردوون، باسی زیندوەکانی نەکردوە، سامانەکانیان بە دۆلاری ئەمریکی :

1. سەرۆکی ئەندونیسی - سوهارتو (15$ بلیون – 35$ بلیون)
2. سەرۆکی فیلیپین - فردیناند مارکوس (5$ بلیون – 10$ بلیون)
3. سەرۆکی زائیر -موبوتو سیسی سیسکو (5$ بلیون)
4. سەرۆکی نایجریا- سانی أباتشا (2$ بلیون – 5$ بلیون) .
5. سەرۆکی یوغوسلاڤیا - سلوبودان میلوسڤیتش (1$ بلیون)
6. سەرۆکی هایتی – جان کلود دوڤالییە (300$ ملیون – 800$ ملیون)
7. سەرۆکی پیرو- ئەلپرتو فوهیموری (600$ ملیون)
8. سەرۆکی وەزیرانی ئۆکرانیا – لیزارنکۆپاڤلۆ ($ملیۆن114 – 200$)
9. سەرۆکی نیکاراگوا أرنولدو أليمان (100$ ملیۆن)

---

[354] محمدالاحمری –الدیمقراطیة (الجذور واشكالیة التطبیق) ص53

10. سەرۆكی فلپین-(78$ ملیون – 80$ ملیون)

**هەندی ئاماری تر بۆ**

1-سەرۆكی ئەكوادورئیستارفائل كوریا ( 1$ بلیون - 2$ بلیون )

2-سەرۆكی ئئۆغندای ئیستا یوری موسڤینی ( 1$ بلیون - 1.7$ بلیون )

3-سەرۆكی ئەنگۆلا ئیستا خوزی ئیدواردو دوس سانتوس (10$ بلیون - 20$ بلیون)

ناوی سەرۆكانی عربی تیدا نیە بەهۆی زۆر مانەوەیان لەدەسەلات ودوای خۆشیان هەر لە بنەمالەكەیان دەسەلاتدارن ، بەلام كۆن ترین لیستی گەندەلی وخیانەت سەرۆكانی عرب بووینە ،لە سەرەتای سەدەی بیستەم یەكەم جار گۆڤارێكی بە هێزی ئەو سەردەم بەناوی (شؤون خارجیة) كە لەندەن دەردەچو لەمانگی 1927/1ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسكریت) لیستێكی بەرتیلی مانگانەی ئەمیروشێخ وكەسایەتی عەرەبی تێدا بلاوكرایەوە: (1 ـ ابن السعود 100.000 جنیه، 2 ـ ملك حسین ـ شریف مكه ـ 100.000 جنیه، 3 ـ فهد الهذال 140.000 ربیه، السید الأدریسي12.000 لیره..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژیەی بۆ بەریتانیا دەیكەن [355].

**كاریگەریە خراپەكانی** : گەورەترین دەردی سەردەمە،تەنانەت لە پرۆژەی ئیخوان مسلمین هاتوە (ان ثالوث المدمرلهذه الأمة هی جمود السیاسی ،فساد والظلم الإجتماعی،تخلف علمی وتقنی )[356] ، بەشێكە لەدەرهاوێشتەكانی دەردی زال بوونی بەرژەوەندی تایبەت بەسەر گشتی ، لەكۆمەلێك هۆكاری ئالۆز دێت،یبن تەیمیە بەشێوەیەكی سەرنج ڕاكیش باسی هۆكاری ئەو دەردەی كردوە تاڕادەیەك (پاڕادۆكسیشە) دەلێ: (أن السلطان ظل الله في الأرض، ویقال: ستون سنة من إمام جائر

[355] عبدالرزاق الحسنی - تأریخ الوزارات العراقیة -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92

[356] بڕوانە دەقی(مشروع اخوان مسلمین للإصلاح) .

أصلح من ليلة واحدة بلا سلطان، والتجربة تبين ذلك... فالواجب اتخاذ الإمارة ديناً وقربة يتقرب بها إلى الله ، فإن التقرب إليه فيها بطاعته وطاعة رسوله من أفضل القربات، وإنما يفسد فيها حال أكثر الناس لابتغاء الرياسة أو المال)[357]، لەبناغەڕا لەوەدێت کەکۆمەلە خەڵکێك پێکەوە لەموئەسسەیەك ئیش دەکەن لەژێرناوی جیاجیا(چینی سەروو)بەشی ئەوانی ترو میللەتیش دەخۆن وەك ئەوەی لە (بەلگەنامە ڕەشەکە)باس کرا، یان بە واتایەکی تر خراپ بەکارهێنانی دەسەلات و یاسا لە پێناو بەرژەوەندی تایبەت سەر بەسانایی سەردەکێشی بۆ گەندەلی، بانکی نیودەولەتیە 6 پیوەری دیاری کردوەبۆ قەلاچۆی گەندەلی چواریان گرنگن وبریتین لە :(قەبارەی سزاو لێپیچینەوە ،ئارامی سیاسی، کارایی حکومەت،سەروەری یاسا) ، چەندین ڕێکخراوو سەنتەری تویژینەوەی بۆ دیاری کراوە ، لە زۆربەی وولاتان بڕیارو یاسای بۆ دەرچوە ، کۆمەلیك کاریگەری خراپی هەیە بەکورتی ئەوانەن:

1- کەم کردنەوەی رۆلی حکومەت ودام ودەزگاکانی .
2- بێمتمانەیی.
3- گەشەنەکردنی سیستەمی سیاسی ودیموکراسی وئابووری .
4- لە هەموی مەترسیدارتر بەرهەم وسیستەمی ئابووری و وەبەرهینان وئالوگۆڕی بازرگانی کەم دەکاتەوە .
5- چینایەتیەکی ناسروشت دروست دەکا بێئەوەی بنەمای چالاکی بەرهەمهێنان دروستی کردبێ، لەو سەرەنجامە دەولەمەندی زۆر دەولەمەند وهەژاری زۆر هەژاریش،بەردەوامیشی دەبتە هۆی زیادبوو نو فراوان بوونی چینی هەژار .
6- گەندەلی وادەکا پێوانەکانی سیاسی ویاسایی ونیشتمانی وەرگەڕێن ، لە جیاتی کەفائەو دلسۆزی خزمەتی گەندەلی دەبێتە چەق.
7- خەلکی ناشایستە دەکەویتە شوینی شایستە .( قالت ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها وجعلوا اعزة اهلها اذلة وكذلك يفعلون )

---

[357] مجموع الفتاوى ج28/290–291

لەوانەوە دەبیە خاوەن حکومەت ومیلەتیکی وا ،کە حکومەتەکە لە ریزی پیشەوەی هەمو دیاردە خراپەکان دەبێت ،لە ریزی دواوەی هەمو لیستە نیودەولەتیە چاکەکانیش دەبێت ،ناوی میلەتەکەشت بە ڕەشۆکی و عەوام وەسف دەکرێت .

لەو بارەیەوە (ڕێکخراوی شەفافیەتی نێودەوڵەتی) بە جۆریکی تر هاتۆتەسەرخەت و دەروازەی زیانەکانی بە وەسفی گەندەلی دەست پێدەکات و تیایدا واهاتوە:

گەندەڵی بریتیە لە خراپ بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتەی کە بەکەسێك دراوە لەپێناو سودی شەخسی.

پیچەوانەی ئەوەشی (الشفافیە)ی واوەسف کردوە ( تعني تسليط الضوء على صفقات مشبوهة، ضعف إنفاذ القواعد والممارسات غير المشروعة التي تقوض الحكومات جيدة، والأعمال التجارية الأخلاقية والمجتمع ككل) .

کاریگەریە خراپەکانی گەندەڵی دابەشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی و تەندروستی کراوە :

گەندەڵی سیاسی: گەورەترین بەربەستە لەبەردەم دیموکرسی و چەسپاندنی سەروەری قانون، هەموو دامودەزگا ڕەسمیەکان شەرعیەتی قانونی خۆیان لەدەست دەدەن ئەگەر هاتوو لەپێناو بەرژەوەندی شەخسی بەرکارهێندران. هاوکات لەژێر سایەی دامودەزگای گەندەڵ پرۆسەی لێپرسینەوە ئامانجی راستەقینەی خۆی ناپیکێت.

لەڕووی ئابوری: گەندەڵی دەبێتە هۆی بەفیرۆدانی سەروەتی نیشتیمانی، سیاسیە گەندەڵەکان سەرجەم پرۆژەکانی وەبەرهێنان لە وڵات دەخەنە خزمەت گیرفانی خۆیانەوە، لە ڕووی دانانی ئەولەویەت بۆ پرۆژە ستراتیژیەکانی وڵات ئەو بوارانە پێشدەخەن کە دەبێتە هۆی سەرچاوەی سوود بۆخۆیان لەجێگای بوارە بنچینەییەکانی. هاوکات بازاڕێکی شێواو دروست دەکات کە قۆرخاری تێدا باڵادەستە و کێبڕکێی تەندروست بونی نیە.

لەڕووی کۆمەڵایەتی: گەندەڵی هۆکاری سەرەکیە بۆ ئەوەی هاونیشتیمانیان متمانەیان نەمێنێت بە سیستەمی سیاسی وڵات و دامو دەزگا ڕەسمیەکان، ئەمەش پشتگوێ خستن دروست دەکات بەرامبەر جێبەجێ کردنی قانون

لەروی ژینگەییەوە :گەندەڵی وادەکات هاونیشتیمانیان ڕێز لە سامانە سروشتیەکانی وڵات نەگرن و، بەشێوەیەکی خراپ لەپێناو سودی خۆیان بەکاری بهێنن کە دواجار زیان بە باری ژینگەیی وڵات دەگەیەنێت.

لەبارەی سروشتی کەسێتیش گەندەلی دەبێتە هۆی دروست کردنی کەسێتی لەرزۆك ودرۆزن ،تەنانەت بۆ دوورڕوویش ، نمونەگەلێ زۆرە بەلام وای کردوە دووڕوویی ئاینی دروست ببێت ، ،لەسالی 1891سولتان عبدالحمید نامەیەکی هەرەشەی بۆ ئیزیدیەکان نارد داوای لیکردن یان ئیسلام بن یان جەنگ دژی ئایەتی(لا اکراه)یش بن ،دوای سوپای بەسەرکردایەتی (عمر وهبی)ناردو دەردی دانیێ،ئەمیر میرزا بەك ووتی دەبمە ئیسلام وسولتانیش بۆهەریەکەی ببتە ئیسلام بڕی 20000قرشی بۆ بڕیەوە ،هەندیکی تریان موسولمان بوون(بە ڕوالەت) بەرامبەر هەندێ یارمەتی گەندەلی ،عمروهبی پاشا بروسکەی بۆسولتان لیدا ووتی هەزارانیان بووینە موسولمان ،بەلام (رۆجر لیسکۆ)دەلێت بەشی زۆری ئیزیدیەکان نەبە تۆبزی ونەبە گەندەلی ئاینی خۆیان نەگۆڕی[358] .

زەمینەوهۆکاری گەندەلی:

مێژووی زۆر کۆنە، لەگەل سەرهەلدانی سیستەمی سیاسی ودەسەلاتە گەورەو بچووکەکان پەیدا بوە ، لە نێو هەمو میلەتێکەوە بە جۆریك لە جۆرەکان هەبوە و هەیە ، دەشتوانین بلێین لە ناو هەمو مەدرەسەو ئەزمونە بەشەریەکان بەدی دەکرێ ،لە دوای خەلیفەی راشدین بەشیکی زۆری پانتایی مێژوویان ڕابواردن وجاریەبازی وگەندەلی بوە، بەلام ناکرێ ئەوە نەگۆترێ کە فەزای ئاینی وفەزای عەلمانی زۆر لێکجیان بۆ جێبوونەوەی گەندەلی ، عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی وەك عەلمانی رۆژئاوانیە پیویستی بە تیکدانی بناغە کۆمەلایەتی وبەشیکی گرنگی کەلتوورو نەریت وفەرهەنگ

358 السياسات الاثثنية فی العراق ص86-87و ص88

هەیە تا جێی ببێتەوە وبشحەسێتەوە ، عادەتەن ئەو هەنگاوانەش بە وێرانکردنی ژێرخـانی کۆمـەڵگا لە ئەخلاق و بەها و ئاکارەکان دەست پێ دەکا، بێ ئەوەی بتوانێ دروستی بکاتەوە، بەو پێیە وای لێ دێت دەسەڵاتی سیاسی و بیری گەندەڵی تەنها بتوانێ لە کۆمەڵگەیەکی گەندەڵ بژی، وەك ئێستـا لـە زۆربەی ئەزموونەکانی عەلمانی جیهانی ئیسلام دەبینین بـە کوردستانیشـەوە. تـاك و سـەرکردەکانی حزبەعەلمانیەکان بە بەرنامەکەشەوە ڕەوای دەدەنـە بەرژەوەنـدی تایبـەتی و کۆکردنـەوەی زۆرتـرین خەڵك لەسەر بنچینەی (پێم بـدە و پێـت دەدەم= take and put).. ئـیتر دیـاردەی وەك: (بـەرتیل، گەندەلی بێ سنوور، بێ بەڵێنیێ، و بەد ڕەوشتی و نیشتیمان فرۆشی و ماستاوچیایەتی و خۆویسـتی، ..) باو وەردەگرێ و بناغەکانی کۆمەڵیش تێك دەرووخێ.. و ترسناك ترین چارەنووسە، بنەمای هـەر خۆم ،هەر بۆخۆم ،هی من ...باو وەردەگرێ،لەو بارەیەوە( ابن القيم )دەڵێت: ( وليحذر كل الحـذر مـن طغيان : أنا ، ولي ، عندي ، فإن هذه الألفاظ الثلاثة ابتلي بها إبليس ، وفرعون ، وقارون :
فأنا خير منه : لإبليس .

ولي ملك مصر : فرعون .

وإنما أُوتيته على علم عندي : لقارون[359] .

به دیویکی تر گەندەلی ناتوانی لە کۆمەلگەیەکی تەندروست سەرهەلبدات ،ئەگەر هەشبێ بە نهێنیەو شازە ، شەرمەزاریە ، کەچی لە نێو کۆمەلگەی تێکڕووخاو پیوەرکان وەردەگەڕێ ئەوەی بیکا بەسەرکەوتووی دەلێن ئەوە زیرەکەو بوە پیاو ،ئەوەی نەیکا بە فەقیر حال ونەزان وەسف دەکریت وجاریش وایە تاوومەتبارە ،ئالێرەیە سەرچاوەی بەرهەمهینانی گەندەلی وهەم ژینگەی ژیانیشی، ئامۆژگاریە بەناوبانگەکانی میکاڤیلی(1469-1547)بۆ دەسەلاتدارەگەندەلەکان دەردەکەوێ کە لەیەکێکیان دەلێ: بۆ ئەوەی زال بیت بەسەر میلەت پیویستە میلەتەکە دوورخاتەوە لە ئەخلاق وئاین[360]، گەندەلی لە زەمینەی ئاین ومەبادیئو ئایدیۆلۆژیان سەرهەلنادات ، ،لە پرۆتۆکۆلەکانی

---

[359] ابن القيم – زاد المعاد في هدي خير العباد ج2 ص37 .

[360] نيقولا مكيافيلي – الأمير-تعليق:موسوليني-ترجمة:خيري حمادي ص150

یەهود ڕوون تر باس کراوە لە پرۆتۆکۆلی(11) دەلیٚ تا بتوانین زال بین بەسەریانا دەبیٚ(ان الأمين -غير اليهود- كقطيع من الغنم، وأننا الذئاب، فهل تعلمون ما تفعل الغنم حينما تنفذ الذئاب إلى الحظيرة؟ انها لتغمض عيونها عن كل شيء) لە برۆتۆکۆلی10 باس لە تیك شکاندنی ژیرخانی خیزانی دەکا (فسوف ندمر الحياة الأسرية بين الأمين، تفسد أهميتها التربوية)[361] ،هەولی داوە جۆری سیاسەتەکە میکافیلیانەبێت وەك لە پرۆتۆکۆلی یەکەمی باسی دەکا بۆ ئەوەی پەیوەندی زانستی سیاسیش بە میلەت لاواز بکاو داگیرکاریەکەی بە ئاسانی بچەسپیٚ ومیلەت وژینگەیەکی سازاو بۆ چاندنی گەندەلی دروست دەکا،(ولید بن یزید)یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەوی و باوەڕی بەخوداو قورئان وزیندووبوونەوە نەبوە [362]،لەهەمان کات گەورە گەندەلیش بوە ، چی بەسەر نیشتمان هێناوە؟خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)،ولایەتیکی تری بە(یوسف بن عمر )بە والی وکارمەندەوە فرۆشت، لە دوا تەمەنی عوسمانی گەندەلی گەیشتە ئەو ڕادە کە ئاووخاك وهەواش بفرۆشن ،بە تایبەتی لەسەردەمی ئیتحاد و الترقی ، ڕووباری دیجلەیان بە 250000لیرەفرۆشتە (کۆمپانیای لینجی) بەریتانیا، ـ لە چەند سەرچاوەیەك هاتوە دەلێن : کاتیٚ کیشە دروست بوو لە نیوان بریتانیاو عوسمانی ئاخۆ عوسمانیەکان (ئیتحادیەکان) دیجلەیان فرۆشتوە یان فورات، لە تۆمارگەکەی خۆیان نەیان دۆزیەوە، بەریتانیا ئەوەی قۆزتەوەو وتی هەردووکم کڕیە. ویلایەتەکانی ڕوملی (ئەوروپا) بەرە بەرە فرۆشران، ویلایەتی تەڕابلوس (لیبیای ئێستا)بە دوو بەلەمی جەنگی فرۆشرایە ئیتالیا[363] ، دوایش دوو بەلەمەکەشی نەدانیٚ، ..لەو سەردەمە کڕین و فرۆشتنی ولاٚت بە تەواوی هەبوولە چوارچێوەی گەندەلی گەورە ، ئەمریکا فلیپینی بە 20ملیۆن دۆلار لە ئیسپانیا کڕی، سەرەتای ئەمریکا 13 ویلایەت بوو زۆربەی ئەو ویلایەتانەی ئێستا بە پارە کڕیەوە، لەسەردەمی پیاوە نەخۆشەکە یەهودیەکانیش هەولێان لە گەلٚ سلطان عبدالحمید دابوو بۆ کڕینی فلستین بەلاٚم قایل

---

[361] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980بروتوكول رقم:(10 ،11) .

[361] مدخل الى الفلسفة ص47 ،49.

[362] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72-73

[363]ـ بروانة: الإسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثة ص77

نەبوو، لەنامەیەکی[364] سوڵتان عبدالحمید بۆشیخ محمود ئەبو شامە دەڵێ: یەهودیەکان بڕی 150 ملیۆن لیرەی[365] ئینکلیزیان پێدام تا سنجاقی قودسیان پێ بدەم،نەمدانێ ، ئەوە هەمو لەو کاتانەیە کە عوسمانی لە گەندەلی نقوم ببوو نیکولا قەیسەری روسیا ناوی نابوو دەولەتە نەخۆشەکە ، دوای ئیتحادیەکان بە 400،000 لیرە قایل بون[366]، دوای بە فەرمی تر سەرۆکانی عرب فلستینیان فرۆشت بە دوو ڕێگە ،بە زێڕو مانگانەی تر لەدوایش لەبەرامبەر پۆست وەرگرتنی شاو سەرۆکایەتی ، لەهەندێ شوینی ترگەندەلیەکان دەگەیشتنە ئەو ڕادەیەی پۆستی والیایەتیش دەکڕاو دەفرۆشرا .

---

[364]ـ دةقى نامةكة: بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله رب العالمين وأفضل الصلاة وأتم التسليم على سيدنا محمد رسول رب العالمين وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين إلى يوم الدين.

أرفع عريضتي هذه إلى شيخ الطريقة العلية الشاذلية، إلى مفيض الروح والحياة، وإلى شيخ أهل عصره الشيخ محمود أفندي أبي الشامات، وأقبل يديه المباركتين راجيا دعواته الصالحة. بعد تقديم احترامي أعرض أني تلقيت كتابكم المؤرخ في 22 مايس من السنة الحالية، وحمدت المولى وشكرته أنكم بصحة وسلامة دائمتين. سيدي: إنني بتوفيق الله تعالى مداوم على قراءة الأوراد الشاذلية ليلا ونهارا، وأعرض أنني مازلت محتاجا لدعواتكم القلبية بصورة دائمة. بعد هذه المقدمة أعرض لرشادتكم وإلى أمثالكم أصحاب السماحة والعقول السليمة المسألة المهمة الآتية كأمانة في ذمة التاريخ:

إنني لم أتخل عن الخلافة الإسلامية لسبب ما، سوى أنني _ بسبب المضايقة من رؤساء جمعية الاتحاد المعروفة باسم (جون تورك) وتهديدهم _ اضطررت وأجبرت على ترك الخلافة. إن هؤلاء الاتحاديين قد أصروا وأصروا علي بأن أصادق على تأسيس وطن قومي لليهود في الأرض المقدسة (فلسطين)، ورغم إصرارهم فلم أقبل بصورة قطعية هذا التكليف، وأخيرًا وعدوا بتقديم 150 مائة وخمسين مليون ليرة إنجليزية ذهبا، فرفضت هذا التكليف بصورة قطعية أيضا، وأجبتهم بهذا الجواب القطعي الآتي: (إنكم لو دفعتم ملء الأرض ذهبا – فضلا عن 150 مائة وخمسين مليون ليرة إنجليزية ذهبًا فلن أقبل بتكليفكم هذا بوجه قطعي، لقد خدمت الملة الإسلامية والمحمدية ما يزيد عن ثلاثين سنة فلم أسود صحائف المسلمين آبائي وأجدادي من السلاطين والخلفاء العثمانيين، لهذا لن أقبل تكليفكم بوجه قطعي أيضا). وبعد جوابي القطعي اتفقوا على خلعي، وأبلغوني أنهم سيبعدونني إلى (سلانيك) فقبلت بهذا التكليف الأخير. هذا وحمدت المولى وأحمده أنني لم أقبل بأن ألطخ الدولة العثمانية والعالم الإسلامي بهذا العار الأبدي الناشئ عن تكليفهم بإقامة دولة يهودية في الأراضي المقدسة فلسطين... وقد كان بعد ذلك ما كان، ولذا فإنني أكرر الحمد والثناء على الله المتعال، وأعتقد أن ما عرضته كاف في هذا الموضوع الهام، وبه أختم رسالتي هذه. ألثم يديكم المباركتين، وأرجو واسترحم أن تتفضلوا بقبول احترامي بسلامي على جميع الإخوان والأصدقاء.

يا أستاذي المعظم لقد أطلت عليكم التحية، ولكن دفعني لهذه الإطالة أن نحيط سماحتكم علما، ونحيط جماعتكم بذلك علما أيضا.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته. في 22 أيلول 1329

خادم المسلمين / عبد الحميد بن عبد المجيد

[365]ـ پارەی بریتانی ئەو کاتیش جونەیهی ئیستەرلینی بوو، لە دەقی نامەکەی تیۆدۆر هرتزل بۆ سولتان باس لە (جونەیه) دەکاو دەڵێ سالانە یەك ملیۆنت دەدەینێ ئەگەر بە پێی یاسای نیو دەولەتی سەربە خۆیی بدەیتە یەهودیەکانی فلستین.

[366]ـ لە کتێبی (**اليهود والدولة العثمانية**) دەڵێ: فلستین بە دوو سینیە لیرە فرۆشرا.

...ئەوانە زەمینەیەکی لە بار بۆ سەرهەلدانی گەندەلی دروست دەکات، سەرەنجامەکەشیەتی ،هەنـدێ هۆکاری تر هانـدەرو یارمەتیـدەرن وهەنـدێکی تـریش هۆکـاری ڕاسـتەوخۆن سـەرجەمیان ئەوانـەی خوارەوەن :

1- نەبوونی سزاو چاودیری وگەورەترین هاندەری گەندەلیە .

2- سیستەمیکی ئابووری نارێك .

3- دیکتاتۆری ودەست گۆڕی نەبوون ولاوازی منافسەی سیاسی.

4- نەبوونی شەفافیەت و شاردنەوەی زانیاری و ئازادیەکانی تر.

5- تیکەل کردنی سیاسەت وبازرگانی .

6- لیێك جیانەکردنەوەی دەسەلاتەکان و حوکمی حزب و بنەمالەو بال بالینی و نەبوونی یاسا لەسەرووی هەموان .

7- منافسەی دوانەیی لە ترۆکی دەسەلات .

8- کەمی پەروەردەی کەسیتی

9- بلاوبوونەوەی نەزانی و ئازادی ومەدەنی و بەها ئاینیەکان .

10- لاوازی ئیرادەی سەرکردە دژ بە گەندەلی .

11- هاوولاتی نە بوون .

گەڕان بەدوای چارەسەر

زۆر جار بە هۆی گەڕان بەدوای چارەسەر پرسێك سەری هەلداوە ، ئاخۆ لە سەرووڕا دەست پێبکرێ یان لە خواروو ؟ بەڕوون تر لە دەسەلات وسەرکردەو ڕابەرو سولتان وخەلیفە یان لە میلەت ورەش ورووت و هاوولاتیان؟ ..بەزۆری ماستاوچیەکان هەولیان داوە ئەو پرسە تێکەڵ بکەن وەلامێکی ڕوون دەست نەکەوێ ،بەوەی میلەت سەرکردە دروست دەکا،یان ئەوانەش هەرلەو میلەتە پەیدابوون و گۆتەی میلەتی خوار سەرۆکی خواربەبەرهەم دەهێنی ...لەگەل زۆر پاساوی تر لەو بارەیەوە (السیوطي)لەکتیبی(مماروواه الأساطین في عدمالمجيءإلی السلاطین)دەلێت:( وإنما الأمراء تطلب العلماء

فتأخذ مما في أيديهم فتنتفع به، فكان في ذلك صلاح للفريقين جميعا، فطلبت اليوم العلماء الأمراء وركنوا إليهم واشتهوا ما في أيديهم، فقالت الأمراء ما طلب هؤلاء ما في أيدينا حتى كان ما في أيدينا خيرا مما في أيديهم، فكان في ذلك فساد للفريقين كليهما)[367] ،بۆیە دەبێت ئەو پرسە لە بەردەستی زاناو فەقیهی ستۆیلی دەربهێنرێت ، توێژینەوەی زانستی وئاینی کۆتایی بەوە هێناوە کە هۆکاری یەکەم کامەیە لەو دوانەییە ،سەروە ،سەرکردەیە ،حوکمە ،ڕابەرە ..ئینجا خراپەکان وگەندەلی وهەرچی هەیە بۆ خواروو شۆڕ دەبێتەوە ،لە ئەفلاتونەوە تا گیزۆ ،لە یەکەم پێغمبەر تا کۆتا یەك ڕابووینە کە سەرچاوەی گەندەلی (یان بەگشتی خراپەو چاکە)لە دەسەلاتدارانەوە دێت، ،ئەفلاتون لەکۆنەوە ووتوویەتی : (المَلِكُ هو كالنهر الأعظم تستمد منه الأنهار الصغار فإن كان عذباً عذبت وإن كان مالحاً ملحت)[368]..مەبەستی سەرۆکی دەولەت وسەرۆکەکانە ، ح( عیسا)ش فەرموییتی ئەگەر خوێ بۆگەن بوو چارە نامێنێ..، لە فەرمودەش هاتوە: (الناس على دين ملوكهم)دەگرێتەوە هەروەك لە كتێبی ( الحضارة الغربية الحديثة)وای ووتوە بێئەوەی ئاگای لەو فەرموودە بێت[369]،بەلام راست کردنەوەیەك بۆ ئەو کتیبەو بۆ زانای گەورە (تۆینبی) دەوێت،کە لەو فەرموودەیە جیایان دەکاتەوە ، فەرمودەکە شیکردنەوەی لۆجیکی دەوێت ،نالیت( الامه على دين ملوكهم )بەلکو دەلێ (الناس)،واتە خەلکی عەوام ورەشۆکی نەك کۆمەلگەیەکی مەدەنی ،بۆیە ئومەو کۆمەلگەی مەدەنی ڕێگرە لە بەرهەمی سولتان وڕابەرو دەسەلاتی گەندەل بەهۆی ئەو ڕێنماییە قورئانیە( ولا تتبع سبيل المفسدين) ،بەلام میلەتی عەوام یارمەتیدەرە ، بۆ قەلاچۆی گەندەلی یان هەر چاکسازیەك دەبێت لەسەروو ڕا دەست پێبکرێت وەك لی کوانی سەرۆکی سەنگافوورە ووتویەتی چاکسازی وەك خاوێن کردنەوەی پەیژە وایە لەسەروو ڕا بۆخواروو دەبێت ، بەلام مانای فەرامۆش کردنی خوارووش نیە.

بۆ چارەسەری گەندەلی هەمو ئەو زانیاریە گشتیانەی پیویستە ئینجا بەشیکی تایبەتیشی پیویستە

---

[367] د عبد الله بن حاسن الجابري- الفساد الاقتصادي أنواعه. أسبابه. آثاره وعلاجه - جامعة أم القرى ص21 .

[368] ابن ابى اصيبعة – عيون الانباء فى طبقات الاطباء ص56

[369] د صفاء عبدالسلام - الحضارة الغربية الحديثة بينن النشأة والتدهور (عصر ايديلؤجيات) ص17

له دیراسەی فەرهەنگ وسایکۆلۆجیاو ئاین وهەندێ لای تری ، بەشە هەمیشەییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناخی مرۆڤ ،واتە بەر لەهەر هەنگاوێك ئیرادە هەبێت(ان یریدا اصلاحا یوفق الله) ، هەمو مرۆڤیك وەك غەریزە ئارەزووی بە کۆکردنەوەی مال وسامان هەیە ،بەخۆدەرخستن ،زال بوون،سنور بەزاندن و خوازیاری زۆرو تەمەلوك و جنس و دەسەلآت و خۆ دیار خستن...هەلەشەی مرۆڤە..، ئەگەر یاسا یان ویژدانیکی بە هێز ڕێی لێنەگرێ گەندەلی لێبەرجەستە دەبێت ، هەرکاتێ ئەو دەروونە زالّ بوو وبواریشی بۆ بڕەخسێ هەلمەتی بۆ دەبا، کەواتە ڕیشەی گەندەلی لە ناخی هەمو مرۆڤیك هەیە ،کە چەقەکەی دەکەوێتە لایەنی دەروونیە (نفس) ، بەکورتی لایەنی سەلبی مرۆڤە (النفس الامارة بالسوء) لایەنی مادی و شەهوانیەکەیە کە زیاتر بەلای دڕندایەتی مەیل دەکا، ئەو کاتە بەرجەستە دەبێت کە دەسەلاتیشی هەبیت وحکومەتیکی گەندەلی لێدروست دەبیت ، بەلام ئەوە سروشت وناخی هەمو مرۆڤیك نیە ،ئەگەر ئەوەشی هەبیت چارەی هەیە نەك بێچارە بێت وەك بەشیك لە زاناو دەروونناسان وای بۆچووینە ، لەوەوە پێیان وایە گەندەلی بنبڕ نابیت مادام سروشتی مرۆڤ خۆویستی ودڕندەیی سیفاتی هەمیشەیی مرۆڤە بیگۆڕان ،..،بۆیە بەلای میکانیزمی تاقانەی سزای توندو سیدارەو ..چووینە ، لەو زانایانەی ڕەشبینن ئەبو عەلای معەری یەکیکە بەرامبەر کۆمەلگەو گەندەلی پێی وایە دیوی ناوەوەی مرۆڤ بە سروشتی خۆی گەندەل وشەڕانیە ودەلیّ:

إن مازت الناس أخلاق يقاس بها فإنهم عند سوء الطبع أسواء

بە هەمان شێوە لە بابەتی (فساد الطبيعة البشرية) پاپاشنۆدە بە پالپشت بەدەقی (كتاب المقدس) بیئومێدە لە چاکردنی مرۆڤ وپێی وایە گەندەلی هەتا ڕۆژی دوای هەردەمێنی بە خراتر، (وظهر فساد الطبيعة البشرية أيضًا في انحلالها، في تعب الجسد وتعب النفس، وستبقى في هذا الفساد إلى يوم القيامة حين "يلبس الفاسد عدم فساد"(1كو 15: 54)، ئەرستۆ لە چوارچێوەی تیڕوانینی بۆ میلەتان مرۆڤی بە (حيوان ناطق) وهۆبز ونیتچەو مرۆڤیان بە گورگ وەسف کردوە، بەشیکی تر پێیان وایە ناخی مرۆڤ گەندەلە بەلام چارەی هەیەو چارەکانیش قورسن ، مەوسوعەی سۆڤیەتی پێی وایە سروشت وناخی مرۆڤ زگماك نیە بەلکو دەگۆڕێت زیاتر دەکەوێتە سەر ژینگەو پەروەردە[370] ،داڤید

---

[370] موسوعة السوفيتية ص284:

هیۆم لە (**مقالة عن طبیعة البشریة**) پێی وایە قەلاچۆی گەندەلی لە قوولایی ناخی مرۆڤ دەست پیدەکات ، رۆسۆبە پیچەوانەی نیتچەو هۆبزپێی وایە سروشتی مرۆڤ لە بنەچەدا گورگایەتی وگەندەلی نیە ،دەلیٚ ئەو بوونەوەرەی خودا بە رژیمە ، لە رژیمیش گەندەلی و شەڕ نیە ،کەواتە ئەوە مرۆڤ خۆی دروستی دەکات نەك بۆی هاتبێت[371] ، هەرچی ئیبن خەلدوونە زیاتر بەلای ژینگە کۆمەلایەتیەکە دەچێت بۆ چاکردن،بە هەمان بۆچوون مۆنتیسیکۆ دەلی ژینگە کۆمەلایەتیەکەی چاکەی گەندەلی چا دەبیٚ ، لەکاتیکا زاناو بیریاریکی زۆر پێیان وایە گەشەی کەرت ومولکیەتی تایبەت چارەیە کەچی مەدرەسەی مارکسی ئەو دەردە لە مولکیەت دەبینی ودەلی تا مولکیەی تایبەتی بمێنیٚ گەندەلیش دەمێنیٚ ، ئوکست کونت پێی وایە تەبیعاتی بەشەریش هەروەك قۆناغەکانی کۆمەلاٚیەتی هەر تاکێك بەسیٚ قۆناغ دەڕوا: لە ئاینیەوە بۆ پراگماتیکی وگەندەلی ، سەرەڕای ئەوەش پێیوایە ئاینیش سەرچاوەیەکی تری گەندەلیە ، ئەو تێڕوانینەیان لە بارودۆخی کنیسەو ئەو هەمو باج وفرۆشتنی بەهەشت و نوشتەوە سەرچاوە دەگریٚ ، ئەوەی زیاتر ئەو بۆچوونە سەلبیە بەرامبەر ئاین تۆخ دەکات و بەگەندەلی دەبەستێتەوە دەبینین هەندیٚ خواوەندی میلەتان بەرتیلیان پیدەدرا وقوربانی و بۆ رەزامەندیان وتوورە نەبوون کارەسات نەبوون ، شۆ-شینگ ئەو خواوەندە بوو کە تەمەن وژیانی بەدەستەوە بوە ،ئەگەر قوربانی پێبدەی ئەوە ئەجەلت دەگۆڕی وتەمەنت دریژ دەکا لەزۆر شوین هەبوە لە رۆژهەلات ومیسر[372]، بیرۆکەی قوربان کردن بۆ خودا تالەبەلایان بگیریتەوە (بناغەی تیگەیشتنی گەندەلی وبەرتیلە)ئەفلاتون دەلی ئەو خوایەی کە ئێوە واباسی دەکەن وەك قازیە تەمبەل وبەرتیل خۆرەکانە[373] .

بەو شێوە دەچینە نێو چارەی ئاینی ڕاستەقینە کە زۆر قوول ترە ، بۆ ڕێگرتنی یەکجاری لە خراپە و گەندەلی وکپ کردنەوەی تەوژمی دەروون و هەڵمەتەکانی ئەوا تەنیا بە مەدرەسە خاوەن مەبادیئە مەزنەکان دەکریٚت ،چونکە چاکسازی بەگەندەلکاران ناکریٚت(ان الله لا یصلح عمل المفسدین )

---

[371] جان جاك روسو-دین الفطرة ص58

[372] بۆ ئەو جۆرە خواوەندە دەستکردانە بڕوانە: **قاموس الخرافات والاساطیر** ص152 .

[373] **د عدنان ابراهیم–مطرقة البرهان وزجاج الالحاد** ص34

،بەخەلکی پاك دەکرێت بە ئایینی دەکرێت ،مادام ئاین (بە تەنها)دەتوانیٚ ڕووبچێتە ململانێی نێوان عەقل و دەروون ، دەتوانی ئەو ململانێیە یەکلا دەکاتەوە لە قازانجی عەقڵ، بەهۆی لێپرسینەوەی دوا رۆژ، هەر بۆیەش (بوویتە کۆڵەگەیەك لە ئیمان)، ئەو بڕوایە وا دەکا هەم عەقیدە زاڵ بێت بەسەر دەروون و هەم چاودێرێکیش دروست بکا، ئیتر بینای کۆمەڵایەتی راستەقینە لێرەوە دروست دەبێت، لێرەوە ئایین دەتوانیٚ ئەو کەلێنانە پڕ بکاتەوە کە یاساو پۆلیس وزیندانی ناتوانن پێی بگەن ، ئەویش دروست کردنی (خۆ چاودێریە) ، کە گەندەلی لەو کەلێنە دزە دەکات ، مانای وایە ئایینداری هەر پرسێکی شەخسی نیە لە نێوان خۆت و خودا (وەك باوە لە ئەوروپا) ، کەواتە مانای راستەقینەی (بینای کۆمەڵایەتی، مەدەنیەت، شارستانی، دروست کردنی مرۆڤ، پێش کەوتن، مافی مرۆڤ، مافی ئافرەت، قەلاچۆی گەندەلی لەوە دێت کە ئەو کۆمەڵە یان ئەو تاکە یان ئەو لایەن و سیستەمە چەندە عەقڵی زاڵ ترە بەسەر دەروونە ئارەزووبازەکەی ، کەواتە ئاین ڕۆلیکی گرنگی هەیە بۆ سەلامەتی کۆمەلگا ، بە پێچەوانەی هەندیٚ بانگیشە گوایە ئاین بارگرانیە بەسەر کۆمەلگەو پیشکەوتنی سەردەمیانە، رێساکانی سەردەمیش داکۆکی لەو ڕاستیە دەکەنەوە، زۆربەی زانایان هەتا (فرۆید و بافلوڤ) ئەو قەناعەتەیان هەیە کە پەیوەندی مرۆڤایەتی لاواز دەبێت لەگەڵ زیادبوونی پەیوەندی مادی، هەروەها چەند یاسایەك هەیە زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانی دەست بە دەست تۆماریان کردووە بەناوی (القوانين الاجتماعية الكونية unvarsal social law) کە دەڵێت: (تزداد نسب الجرائم في المجتمعات التي تلعب فيها الدين دورا هامشيا وثانويا)[*]، لەوەوە(وەك تیۆری) دەردەکەویٚ ئایدیۆلۆجیاو ئاین ومەبادیئی سەلامەت ترن نەك سیستەمە لیبرالیەکان کەچی لەواقیعدا وا دەرناکەویٚ ،بەلام بەهەمان برِ ئەگەر گەندەلیش بووبەزەحمەت چاکسازی لێدەکریٚ ،هەروەك چاکسانیەکانی مارتن لۆتەر(95بەندەکە) لەدژی گەندەلی ئاینی مەزهەبی پرۆتستانی لێدروست بوو ،لە سۆڤیەتیش چاکسازیەکانی گۆرباتچۆڤ وولاتەکە بوە 16 پارچە ،زۆرجاری تریش چاکسازی حزبی ئاوا پارچە پارچەیی دەبێت .

لە ئەزمونی دەسەلاتی دادگەریش میکانیزمی (ئەوەت لە کیٚ بوو؟ - من این لك هذا؟) لە هەمو ئامرازیکی دژە گەندەلی بە هێزتربوە ، هەروەك (القاموس السياسی) زاراوەی گەندەلی بەستۆتەوە

---

[*] بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة العلم الاجتماع) ص506.

به بنەمای(من این لك هذا) كە بوە یاسا لە زۆر وولات ،تیایدا لەو پرۆسە دەكۆلیتەوە كە بە هۆی پیگەی دەسەلاتی سیاسی وكۆمەلایەتی وەردەچەرخینی بۆ كۆكردنەوەی مالو سامان بە نارەوا[375]، واباوە كە یەكەم جار ئەو بنەمایەی دژ بەگەندەلی (من این لك هذا) لەسەردەمی دادگەریەكانی (ح عمر) هاتوە ، ئیبن خەلدوونیش لەبەرامبەر بەرپاكردنی شارستانی وچاكسازی بە پێی سەردەمی خۆی باسی گەندەلی كردوە ، لە بەشی (في أن العمران البشري لابد له من سياسة ينتظم بها أمره) باس لە پەیوەندیەكی ئۆرگانیكی نێوان بەرپاكردنی شارستانی وسیاسەتی دادگەرانەو عیبادەت دەكا ، نامە ڕینماییەكی (طاهر بن الحسين) بۆ كوڕەكەی (عبد الله بن طاهر) كەلەلایەن (مأمون)ەوە ویلایەتیكی میسری پیسپیردابوو ،تیایدا دەلیٚ ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی ورِاویژ بە زاناو شارەزایان ودووركەوتنەوە لە گەندەلی وخزمایەتی وبالبالینی و..بنچینە دەسەلاتیكی هەمیشەیی دەبیت .

ماوە بلێین لەو سەردەمەی ئیستا باش ترین نمونەی سەركەوتو بەسەر گەندەلی لە ماوەیەكی پێوانەیی كورت ئەزمونی سەنگافوورایە ، لە وەرگرتنی سەربەخۆی وگەشە لە جیهانی سێیەمەوە بۆ یەكەم لە پاكی و(دژە گەندەلی) دێت ، لی كوان لە (یادەوەریەكانی خۆی) باسی خۆی ونەهرۆی هند دەكا كە چۆن سەرسام بووینە بە پاكی چین و ئاوا گەشەكردنی ، لی كوان(سەرۆك وەزیرانی پیشووی) دەلیٚ ئێمە لە سەرەتا بە پاكی وشایستە خەلكمان هەلبژارد نەك خزم وحزبی خۆیی ،لە سالی 1959 لەبەرچاوی خەلكی لە سویندی یاسایی جلێكی سادەو پانتۆلیكی سپی وەك نیشانەی كارو سادەیی ودژبە گەندەلیمان لەبەر كرد ،ڕوومان لە دزە گەورەكان كردو دوورمان خستنەوە ئینجا بچووكەكان خۆیان توانەوە،دوا هەنگاو لە1960 یاسایەكمان دەركرد كە دیاری بچوكیشمان قەدەغە كرد بۆ پیاوانی دەولەت، لەسالی 1963 هەمو میلەتمان بەشدار پێكرد لە بینینی هەر دۆخێكی گەندەلی بچوك یان گەورە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ[376] ، واشمان كرد میلەت دەنگ بەگەندەلان نەدەن هەروەك بۆ وەزیری پەرەپیدان ڕوویدا لە 1963 دۆڕاندی و دادگایش كرا .

---

[375] القاموس السياسي –احمدعطية الله ط3 ص1226

[376] لی كوان –من العالم الثالث ال الاول ص211-212 ، ص495

## گەندەڵی لە کوردستان

**ڕیشەی لەکوردستان:** مێژووی گەندەڵی بەو تەوژمەی نوێیەلە کوردستان کۆن نیە، ئەوەش بەشێکە لەدیاردەکانی وەك جاشایەتی و براکوژی و توندووتیژی ..سەرچاوەکەشی لەو داڕزانەی ژێرخانی ئەخلاقی کوردەواری دێت(لە چاو جارانی) کە لەو دواییە هاتوە ، ڕەنگە لەمێژووی کۆنی دەسەلاٌتی سیاسی کوردستان نمونەی وانەبوبێ، ئەوەش زۆر پەیوەندیدارە بەو سەرکردایەتیە عەلمانیە نوێیەی بزوتنەوەی کورد، جارجار جۆرێك لەگەندەلی باس کراوە لەشۆڕشی ئەیلول لەلایەن دۆستانیش ( هەروەك کەمیك لەو باسە لەلایەن هەژارموکرایانی کراوەو لە ووتارەکانی بارزانیش گلەیی وپێش بینی وا کراوە سەبارەت بە بەرپرسان ، لەبارەی بێ ئومێدی مەلامستەفا لەو مەسئولانە وتوویەتی (حکومەتی عێراق بێ ئەقلە، ئێمە داوای حوکمی زاتی دەکەین کەچی ئەوان دەستی بەدەستیمان پێ دەکەن، ئەگەر ئەقلیان هەبێ سەربەخۆیی تەواومان پێ دەدەن ئینجا بزانە دوای شەش مانگ لێپرسراوانی کورد چی بەسەر ئەو میللەتەدەهێنن)[377]... بەلاٌم بەو قەبارەیە دیاردەیەکی نوێیە .

ئەگەربەوردی پەنجە لەسەر سەرەتاو ڕیشەی ئەودیاردەیە دابنێین ڕێك دێتەوە لەگەڵ مەنتوقی ئەو ڕێسایەی کە : زۆربەی ئەو دیاردانە بەچاك و بەخراپییەوە سەرەتاکەی بۆ (ی، ن، ك)ی ویستیڤالیای کوردستان[*]دەگەڕێتەوە، بۆیە دەبێ سەرەتا و ڕەگەکانی لەوێ بدۆزینەوە، هەڵبەتە لەسەرەتای شۆڕشی نوێ کەبەئایدۆلۆژیایەکی مارکسی مەبدەئی کەوتنە کار زۆر دووربوون لەو جۆرە دیاردانە... تاسەرەتای هەشتاکان، ئینجادوودیاردە کەوتە نێو شۆڕش، یەکەمیان بەرە بەرە بناغەی فیکری مارکسی کەوتە داڕزان و ناچار کۆمەلەی رەنجدەران بۆ پارێزگاری لەو دەسەلاٌتەی لەنێو یەکێتی پەیدای کردبوو جۆرێك لەئیمتیازو لێ بووردنی سزاودیسپلینی بەئەندام ولایەنگرانی بەخشی بەتایبەتی عەشایرەکان، ئەوە لەلایەك لەلایەکی تر دانانی بارەگاو ماڵ و حاڵ بۆبەرپرسان و پێنەدانی نەسریە (بودجە) وای کرد بنەمای (خۆتان بژیەنن )پەیڕەو بکرێ، ئیتر لەپاڵ ئەوە بواردرا دەست

---

377شەوکەت ئەمەلائیسماعیل – ڕۆژانی لەمێژووی شۆڕشی ئەیلول ل5

[*] سەرەتای زۆربەی چەمك ونەریتە نێو دەولەتیەکانی ئەوروپی بە چاك وخراپییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ویستیڤالیای 1648 .

کەوت و چەکی زیادە بفرۆشن[**] و سەرەتای گەندەلی دەست پێ کرد، بەتایبەتی لەجەنگە گەورەکانی1982- 1983 وەك شەڕی پشت ئاشان ودوایش بێتواتە، بەلاّم ئەوەی زۆر ئەودیاردەیەی زەق کردەوە شەرمی شکاند ئەو ڕووداوەبوو لەبێتواتە: دوای ئەوەی بێتواتە کەوتەدەست شۆڕش، ئیتر نەك هەر بارەگاو مالەجاشەکان بەڵکو بەگشتی ئەوناوچانە تالاّن کران، کاتێ مام جەلال وسەرکردایەتی یەکێتی بەهەڵچونەوە لیژنەیەکیان پێك هێنا بۆ بن بڕ کردنی ئەودیاردە ترسناکە بەسەرۆکایەتی (ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی-علی حویز ) ڕوداوێکی زۆر دەگمەن ڕوویدا، ئەوە بوو لەکاتی لێکۆلیەنەوە وسەین وبەینی دا کلاشینکۆفەکەی (ئەندام مەکتەب سیاسیە)کەش لەلایەن گەندەلچی وتالاّنچیەکان دزرا، یەکسەر ئەو لیژنەو بەرنامەکەش تێك وپێك ڕووخاو دەنگی دایەوە و بووە هاندان و پشبڕکێ لە سەر کۆکردنەوە... ئیتر ئەوبارودۆخە دەروونی وئابووری وسیاسی و فیکری ئامادەبوو بێ کۆنترۆل، ڕاپەڕینی 1991یش بواری رەخساند و بەرپرسان ولایەنگرانی ( ی، ن، ك )دەست پێشخەری ئەوکارەبوون بێ لێپرسینەوە ناویشیان لێ نرا هێزی ( ئاڕئاڕ)بەمانای ڕاو ڕووت ، ئەو هێزە شانازی پێکراو بوونە خاوەنی دەسکەوتی مادی بە هۆی هەمان دەستکەوت شوێنی باشیشیان بۆدابین کرا، ئەوەی زۆر دەسکەوت و تالاّنی هەبوایە پێیان دەووت بۆ خۆی بوە پیاو!! واتە جۆرێك لە ڕای گشتیشی وەرگرت بە ئیجابی، ئیتر ئەودیاردەیە لەنائاسایی و دزێوی وەك دیاردەی جاشایەتی ئاسا _ پەڕیەوە بۆدیاردەیەکی باوو سروشتی وتائەورادەیە ئەوەی پێ ی هەڵنەسایەو ناوی نرا نەزان و بێ ئەقڵ، ئەو چینە گەندەلچیە شارەزایی شاری کەم بوو وەکو مەنجەل و سەرقەپاخ (پیش لیبووردن) بوونە هاوپەیمانی جاشە تالاّنچیەکانی ئەنفال لەو پێناوەدا، بەو شێوەیە لە ڕاپەڕین شۆڕش سەرکەوت بەسەر جاش وخۆفرۆش بەلام بەهای خۆفرۆشان زال بوو بەسەر بەهای شۆڕش ،ئیتر گەندەلی ئیستا لە زاوزێی ئەو دووتەوەرە هاتوە ، واتە ڕەچەلەکێکی دەچێتەوە سەر بەهای 350 فەوجی خەفیفەو لەوێش بۆ ئەو چینەی هەر بەرژەوەندیان لەگەل داگیر کەر بوە تادەگاتە سوارەی حەمیدی .

هەر بەو شێوەیەئەودیاردەیە پەڕیەوە نێو حزب و لایەنەکانی تر بەخێرایی ... ئەوەی زۆر بەرگری و دژایەتی ئەودیاردەیەی کرد سەرۆکی(پ د ك) بوو لەو دەمی، لەسالی1991ەوە ناوی نان (مافیا)

---

[**] بە تایبەتی لەو سەردەمیش وا ڕێکەوت پیش مەرگەیەکی زۆر تەسلیم دەبوونەوە وچەکیان بە جێ دەهێشت .

[378]،بەڵام پێشی پێنەگیراوئێستا(پ د ك)ئەویشزیاتر لەهەموان دووچاری ئەودەردە بووە ، سەرۆکە کەشی بوویتە پاریزەریان, زۆرجاربە هەلەدیکتاتۆریەت وگەندەلی لێك دەبەستن،مۆنتیسیکۆدەلیٚ گەندەلی مەترسیدارترینیانە بۆ سەر هەرمیلەت و حکومەتیك کەتۆتالیتار نیە ،واتە ئەگەر تۆتالیتار بێت مەترسی گەندەلی گەلە زۆر نیە چونکە جمکن ،لە ڕاستیدا حوکمی میراتی بوار بۆ گەندەلی دەرەخسێنیٚ نەك دیکتاتۆر ، ( مۆسولینی ) بەناوبانگ ترین دیکتاتۆر بوە کەچی ئەو لە سالی 1927ز بەتوندی دەستی لەگەندەلی ومافیا وەشاندن و کۆتایی پیٚ هێنان، هەرچەندە لە کوردستان خەستی گەندەلی دیکتاتۆری وحوکمی بنەمالەی فراوان وتۆخ کرد.

دوای شەڕەکانی براکوژی (ی، ن، ك )لەگەڵ (بزوتنەوە)دوایی لەگەڵ (پارتی)...، پاڵنەری بنچینەیی شەڕکردن تالاٚن و دەسکەوت بوو، ئیتر هێزەکانی ئەنفالچی لەعەشایرەکانیش هاتنەوە بەئاسایی پێکەوە نوسانەوە لەگەڵ ئەو گەندەڵیە ... تەنانەت سکرتێری گشتی (ی ن ك) بەئاشکرا گوتی هێزی (ئارئار)لەهەمو هێزەکان ئامادەترو ئازاترن .... ئیتر ئەوحکومەتەی کوردستان لەوانە پێك هاتوە یاخود بلێین لەمافیا پێك هاتوە ( (هەروەك مەسعود بارزانی)ناوی نان...، مانای چارەی زۆر بەزەحمەت دەبیٚ لەچوارچێوەی ئەو حزبانەی ئەو دەردەیان گرتووە، تاڕادەیەك ئەو حزبەخاوەن ئایدۆلۆژیانەی وەك ئیسلامیەکان وچەپەکان لەوانە حشع و پەکەکە .. کەمتر ئەو دەردەیان گرتوە، دەشیٚ قەلاٚچۆکردنی ئەو گەندەڵیە بەدەسەلاٚت گرتنەدەستی ئەوانە چارە سەر بکریٚ .

<u>ناسنامەی سیاسی وکۆمەلایەتی وبایۆلۆجی گەندەلکاران:</u> بۆ دۆزینەوەی چارەی گەندەلی پێویست بەدیاری کردنی ناسنامەی گەندەلکارانە تا پانتاییەکە تەسك بکرێتەوە ،تا پانتایی فراوان تر توومەت بارتر بکرێت چارە دوورتر دەکەوێتەوە ،هەولدراوە پۆلینێکی سەرەتایی بکرێت ئاخۆ ئەو چین

---

[378] مافیایی وگەندەلی لێك جیان ،دەکریٚ بلێین مافیا دیوێکی تری گەندەلی گەشەسەندوە ،بۆیە پێناسێکی پێویستە : لە بنەچەدا مافیا ناوی کۆمەڵێکی نهێنی بوو لە (سقلیە) لە سەدەی (15)، ئەندامیەتی لەو کۆمەڵیە تەنها بۆ ئەوانە بوو کە توانای چەقۆ وەشاندن بوون و پابەندیش بوون بەو نەریتیە ڕێگری باج وەرگرتن و سەودای تۆڵە سەندنەوەو پارێزگاری کردنی ئەندامانیان بەو ئامرازانە، لەدوای پەرەسەندنی بەدکاریەکانیان لەسەرانسەر ناوچەکە تا ئیتالیاش، دوای پەڕینەوە بۆ ئەمەریکا لەوێش ئەو دەستەو تاقمەی مافیایان دروست کردەوە، کارو پیشەیان ڕێگریو قاچاغی .

وتوێژانەی چەقی گەندەلین لەکام دابەشی کۆمەلایەتی وسیاسی ونەژادی و ڕەگەزی جێیان دەبێتەوە ،ئاخۆ زۆرینەی گەندەلکاران لە چ چین وتوێژێکن لەکۆمەلگەی کوردستانی : (نێر- مێ) ، (حزبی — هاولاتی) ،(فەرمانبەری سادە —بەرپێوەبەرەکان) ،(پەرلەمان-حکومەت) ،(کەمایەتی —کورد) ،( سەرکردە—ئەندامی سادە)،(ئاینی —لائیکی)،(گوندی —شاری)،(زراعی —سناعی)، (دیموکراسی خوازەکان — متزمتەکان) ..بە سانایی دەردەکەوێ تا بەرەو سەروو تر لە حکومەت وحزب و کۆمەلگە بڕۆیت گەندەلیەکە خەست تر دەبێتەوە ،ئەوەیان نیشانەیەکی تایبەتە بۆ کوردستان ،لەجیهان تابەرەو سەروو بڕۆیت گەندەلی کەم دەکا ،زۆربەشیان لە ڕەگەزی نێرن ،زیاتر شارین ،تێکڕای حزبین ،کەمتر کەمایەتیەکانن، زیاتر لائیکیەکانن،

<u>**ئاماژە گشتیەکانی گەندەلی لەکوردستان :**</u> ڕای گشتی (تاك وکۆ) هەیە کە گەندەلی لە کوردستان بە فراوانی هەیە، بەلام بەپێی بەرژەوەندی ونزیکی ودووری لە گەندەلی ولە دەسەلات دان بە قەبارەی گەندەلی دەنێن ،جاران نکولیان لێدەکرد وبەتوندی وەلامی ئەوانەیان دەدایەوە کە دەیان ووت گەندەلی هەیە ،دوای داوای بەلگەیان دەکرد ئیستا دەلێن هەیە،..هیشتا هەمویان نالێن گەیشتۆتە پلەیەکی مەترسیدار ،هیشتا هەندێ پاساو دەهێننەوە، بەلام بەگشتی دووجۆە ئاماژەی ڕوون هەیە لەکوردستان سەبارەت بەگەندەلی :

**یەکەم ئاماژەی بەلگەنامەیی:**

1-ڕاپۆرت و ڕاسپاردەکانی کۆنگرەی هەمو حزبەکان .

2- پاکێجە چاکسازیەکانی حزبەکان وکارنامەی حکومەت .

3-ڕاپۆرتی لیژنەی چاکسازی سەرۆکایەتی هەرێم وەسفی گەندەلی لە کوردستان بە مافیا کرد

**دووەم ئاماژەی بەرچاوی نێو کۆمەلگەودەسەلات :**

1-سەرهەلدانی ملیۆنێرو دەولەمەندی گەورە بیئەوەی لە ژێرخانی ئابووری و چالاکی بەرهەمهێنان بوونێکی وای هەبێت

2-بۆ یەکەم جار پەیدابوونی چینایەتیەکی ناسروشتی .

3-سست کردنی دام ودەزگاکانی چاودیری ودەستپاکی..

4-دەولەمەندی کۆمپانیاو هەژاری وقەرزاری حکومەت .

5-شاردنەوەی هەوال لە دەسەلاتی چوارەم(ڕاگەیاندن) .

6-ئەو چینە گەندەلە لەسەرووی یاسان وسزاو ئەرکی هاوولاتی بوون نایان گرێتەوە (یان بەدیویێکی تر زۆربەی یاسا شکێنەکان ئەوانەن کەچی ئەوانەی سزا دەدرین ولە زیندان و سزای مادی خەلکی هەژارو هاوولاتی سادەن)

لێرەداجیاوازی گەندەلی کوردستان وگەندەلی شوینانی تردەردەکەویێ ،لە شوێنان دام ودەزگای چالاکی بۆ تەرخان کراوەو هەریەك زانیاری لەبارەی گەندەلی بدا پاداش دەکریێ وپاسەوانی دەکریێ بە پێی دەستوریان و بە پێی مادەی (32 و33 )ی ریکەوتنامەی (نەتەوەیەکگرتوەکانی قەلاچۆی گەندەلی) ،کەچی لە کوردستان ئەو دەزگایانە یان نیە یان بۆ پەردەپۆشیە ،بەپیچەوانەش ئەوەی زۆر سوور بێت لەسەر قەلاچۆی گەندەلی بە فەرمی لای دەسەلات تووشی سزای جۆراوجۆر دەبێتەوە

لە شوێنان ئەگەرهەبیت بە نهینیەوبە ترس ولەرزدەکرێت لە ترسی سزا(بە پێی مادەی 10ی قەلاچۆی گەندەلی) ،کەچی لێرە بە ئاشکراو بەشێك لەدام ودەزگای حزبی وحکومی یارمەتیدەریەتی .

لەهەمو دونیا گەندەلی بە (درۆزن وخائین وڕووڕەش) پیشان دەدرێت(دیباجەی بڕیاڕی نەتەوە یەکگرتوەکانی ژ:58/4)، کەچی لە کوردستان خەریکە ڕای گشتی وەردەگریێ وئەوەی نەیکا توشی تەنگەبەری وسزاو دوورخستنەوەدەدرێت وئینجا بە فەقیرحال ونەزان وەسف دەکریت .

## گەندەلی لەیاساکانی زەوی وئاسماندا

هیچ ئاین و مەبادیئێك نیە دژایەتی ئەو دیاردە ترسناکە نەکا ، لە قورئانی پیرۆز هاتوە : (..ولا تبغ الفسادفي الأرض إن الله لا يحب المفسدين القصص : 77 ) ، لە (كتاب المقدس) لەهەردوو بەشی (عهدالقديم )و(عهدالجديد) بەتوندی سەرزەنشتیان کردوە (لان الظلم يحمق الحكيم والعطية تفسد

القلب- جا 7: 7 ) لة شوينيكى تر: (وقال ايها الممتلئ كل غش وكل خبث يا ابن ابليس يا عدو كل بر الا تزال تفسد سبل الله المستقيمة- اع 13: 10)،له دیباجەکەی یاساکانی حەمورابیش بوونی خوداو قەلاچۆی گەندەلی پێکەوە بەستوە .

بەهۆی ئەوەی گەندەلی سەرچاوەی ستەم ودواکەوتن وهەژاری ونائارامیە..هەر لە بواری ئاینی وئەخلاقی قەتیس نامێنێت ،ئینجا کاریگەریەکانیشی لە وولاتێك قەتیس نامینیت ، بۆیە کۆمەلێك بنەماوریکەوتنامەی دەولی بۆ مۆرکراوە بەڕوونی لە بنەماکانی شۆڕشی فرنسی 1789ز هاتوە ، لە شێوەی جارنامەی مافی مرۆڤ وهاوولاتی هاتوە پیکهاتوە لە 17 مادە ،لەلایەن ئەنجومەنی کاتی فرنسی دەرچوە لە 26/ئۆگست/1789، ئەوەیان لەمادەی یەك واهاتوە :**إن ممثلي الشعب الفرنسي، الملتئمين في جمعية وطنية، إذ يؤكدون أن الجهل والإهمال وعدم احترام حقوق الإنسان هي وحدها أسباب شقاء المجتمع وفساد الحكومات**...، لەو دواییەش چەندین ڕێکەوتنامەی بۆکراوە ،ریکەوتنامەی 1996/3/29 لەلایەن ریکخراوی وولاتانی ئەمریکا[379] ،ریکەوتنامەی 26ی مایۆی 1997ی یەکیتی ئەوروپا، ریکەوتنامەی 9ی دیسەمبری 2003ی یەکیتی ئەفریقی ..دوای ئاستی ریکەوتنامەکان لە شێوەی چەکیکی دەولی لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان کرا یاسای دەولی لە 31ی ئۆکتۆبەری 2003 ،ژمارەی بڕیاڕ:58/4 پیکهاتوە لە 71مادە .

دەولەتی عیراق بە فەرمی بە پێی یاسای‌ژ:34ی سەرۆکایەتی لە 14 / 12 / 2005 و (ژ:35ی 2007) ئەو ڕێکەوتنەی وەرگرتوەو هەر 71مادە دەبێتە یاسای عیراقی بەکوردستانیشەوە [380]، لە

---

[379] الديمقراطية والحريات العامة –معهدالدولى لقانون حقوق الانسان (جامعة ديبۆل) ص19.

[380] مجلس الرئاسة
قرار رقم : 34
بناء على ما اقره مجلس النواب طبقا لاحكام المادة ( 61 / رابعا ) من الدستور واستنادا الى احكام المادتين ( 73 / ثانيا ) و ( 138 / سادسا ) من الدستور.
قرر مجلس الرئاسة بجلسته المنعقدة بتاريخ 12 / 8 / 2007
اصدار القانون الاتي: المادة 1: تنضم جمهورية العراق الى اتفاقية الامم المتحدة لمكافحة الفساد لعام 2004 التي دخلت حيز النفاذ في 14 / 12 / 2005.

المادة 2: ينفذ هذا القانون من تاريخ نشره في الجريدة الرسمية.

مادەی 14 داوادەکات سیستەمیکی سەرتاپایی ڕووبەڕووبوونەوەی لەهەرووڵاتێك بۆ ڕێکبخرێ ،لەمادەی 15 گەندەلکار بە تاوانبارهەژماردەکرێت ، لە یاسای عیراقی ژ:111ی سالی 1961ەوە هەمان فەرمنی هەیە ،لەمادەی 17 تا20 باسی دەست بردنە بۆ مالی گشتی ودەولەمەند بوونە بەنارەوایی ،کە لەپیناسی نەتەوە یەکگرتوەکان بە زاراوەی (العائدات الاجرامیە)ناوبراوە ،مادەی 44 تایبەتە بە هاریکاری وتەسلیم کردنی تاوانبارانی گەندەلیە ،لە بەشی پینجەم(لەمادەی 51ەوە ..) باسی چۆنیەتی گێرانەوەو لێسەندنەوەی ئەو سامان ودەولەمەندیەیە ..کۆمەلێك وولات هەن هەمو بەندەکانی جێبەجێ کردوە هەشە بەشێکی باش ،ئەوەی هیچی پێ جێبەجێ ناکرێ وزیاتر لەوەش ئەو وولاتەی دژی هەر 71 مادەکە بێت عادەتەن ئەوە دەکەوێتە خانەی کلیپتۆکراسی ،واتە خودی حکومەتەکە گەندەلە ،دەولەتی عێراق کەوتبوە دۆخێکی مەترسیدار بە پێی ئەو 71 مادەیە ،بەلام بەهۆی ئەو چاکسازیانەو ئیجرائەتانەی بەرامبەر گەندەلکاران دەیکەن تارادەیەکی باش خۆی لێ دور خستۆتەوە ،مەترسیەکی زۆر هەیە حکومەتی هەریم لەخانەی (حکومە الفاسدە)و کلیپتوکراسی نزیك بێت .

ریزبەندی گەندەلی کوردستان لە جیهان: بە پێی ڕاپۆرت و ئامارەکانی شەفافیەتی نێودەولەتی عیراق وکوردستان لە ڕیزی پیشەوەی وولاتانی گەندەلن کە پلەیان گەیشتۆتە لە 92٪ ، واتە 8 لە سەدایان وەرگرتوە ،لەکاتێکا ئەوانەی پاکن (وەك وولاتانی ئەسکندینافی و سەنگافورا.)91 یان هێنابوو .

گەندەلی لە دیکتاتۆری وتۆتالیریاتی وحزبایەتی بێبنەماو دەستگۆری نەکردنی دەسەلات نزیکە وەك (مونتیسیکۆ) دەلی گەندەلی وتۆتالیریتی هاورێن، بۆیە بەشی هەرە زۆری قەبارەی گەندەلی لە وولاتانی عربی کۆبوویتەوە .

---

جلال طالباني- رئيس الجمهورية
طارق الهاشمي- نائب رئيس الجمهورية
عادل عبد المهدي- نائب رئيس الجمهورية

**<u>گەندەڵی وقۆناغی رزگاری نیشتمانی</u>** : گەندەڵی بۆ هەمو قۆناغێك مەترسیدارە ،بەلام بۆ قۆناغی رزگاری یەكجار زۆر ، ناپلیۆن بۆناپارت لەكۆنەوە ووتویەتی: چەندكەسیكی ئازام بۆ بهێنە سوپایەكی گەورەت لەگەندەل ودز بۆ تیك دەشكینم ، ئەو گەندەلیەی كوردستان باشترین نمونەی ئەو بابەتەیە كە بینرا چی بەسەرهات و ئەزمونی جەنگی جیهانی یەكەم و چارەنوسی عوسمانی بینرا، داگیركەر دەیەوێ داگیركراو گەندەل بێت ونمونەكانی سەروو دووبارە بخوێنەوە .

(11)

## كۆنفدرالی كۆنفدڕاڵی Confederation

ئەوانەش دەگریتەوە ( كتاب الابیض– كۆمۆنویلس– ئیسراستین–لۆرانس– كتاب البرتقالی ،.. )

بریتییه له هاوپەیمانی دوو دەوڵەت(یان زیاتر) لەسەر ئاستەکانی ناوەوەو دەرەوە, بە پێی (قاموسە دەستوریەکان) مەرج نیە هەر کۆنفدرالی لە نێوان دەولەتان بیت ،زۆر جار لە نیوان یەکیتیە پیشەییەکانیش ڕوودەدا [381]، بەشی زۆری لەوە بەهەڵەدا دەچن کە زاراوەکە بەشێکی فیدراڵی تێدایە, وای دێتە بەرچاو کە قۆناغێکی گەشەکردووی فیدراڵی بێت, لەسەرەتا لامرکزی و ئۆتۆنۆمی و فیدراڵی و کۆنفیدراڵی و دوایش سەربەخۆیی، واتە ئاڕستەی گەشەی دروست بوونی کۆنفیدرالی لەناوەوەیە ،کەچی ئاوانیە، بەلکو پرۆسەیەکە لەدەرەوە بۆ ناوەوەیە , دەبێ کۆنفدراڵی بە مانا ڕاستەوخۆیەکەی لێك بدرێتەوە, فیدراڵی مانای هاوپەیمانیە, هەرچی (کۆن)ە کە کەوتۆتە سەر(فیدرال) ئەوا زیاتر لە هاوپەیمانی قووڵی دەکاتەوە, وەك ئۆردینەیت و کۆئۆردینەیت لە بیرکاری خوێندراوە لە پرسی (ڕوتەختی دیکارتی) .

ئەگەرچی ئێستا نمونەی بەرجەستەی تەواوی کۆنفدراڵی دەگمەنە, مەگەر شێوەی یەکێتی ئەوروپی و هاریکاری کەنداوو فرانکۆفۆنی و کۆنسویلس و جامیعەی عربی,... ئەوانە نزیك بن لە کۆنفدراڵی ، هەرچی کۆنگرەی ئیسلامی, یەکێتی ئەفریقی, وولآتانی بێلایەن... لاوازترە لەو وەسفە, بەڵام لەمێژووی نزیك لە ئەمریکاو ئەڵمانیاو سویسرا و هەندێ وولآتانی تر بەقۆناغی کۆنفدراڵی ڕەت بووینە, واتە کۆنفدراڵی دەوامی زۆری نەبووە یان وەرچەرخاوەتە بۆ فیدراڵی یان لێك جیا بووینەوە ، کەمتر مژاری تری وەرگرتوە ،بۆیە مشت ومڕێکی یاسایی و سیاسی و مێژووی زۆری لەسەر نەکراوە ،هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش پیناسەکانی زۆر لێك دوور نین ئەگەر چی بە ڕوانگەی جیاجیا بۆ داڕژراوە، ئەوانەی خوارەوە هەرە گرنگەکانیەتی :

+ قاموس المعانی : کۆمەلە ویلایەتیك یەکدەگرن لەسەر ئاستی دەرەکی وەك بەرگری هاوبەش وهەندێ بەشی سیاسەتی دەرەوە.

---

[381] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة –د احمد سعیفان ص279

**+ مصطلحات سياسية الشائعة :** كۆنفیدرالی بە هۆی مۆرکردنی هاوپەیمانی لە نێوان چەند وولاتیکی تەواو سەربەخۆ دەکرێت ، تیایدا رێك دەکەون لەسەر پەیوەندیە ئابووری و سیاسی وفەرهەنگی وسەربازی .

+**مصطلحات سياسية ومعانيها:** كۆنفدرالی ناوێکە بۆ هاوپەیمانیەکی یەکگرتوو لە پێناو هێنانەدی چەند ئامانجیکی هاوبەشی وەك بەرگری وئابووری و فەرهەنگی

+(المعجم الحديث للتحليل السياسي) : هو دولة مركبة تتكون من مجموعة من الدول المستقلة ذات السيادة تتفق فيما بينها بموجب معاهدة دولية على انشاء هيئة مشتركة يتم منحها صلاحيات وسلطات سياسية خاصة للتنسيق بين سياسات حكومات هذة الدول فى مجالات الدفاع والأمن والسياسة الخارجية[382]

+ پیناسی (Stanford Encyclopedia of Philosophy) کەمیك جیاوازی لەگەل ئەوانی تر هەیەو پیی وایە بریتیە لە سیستەمێکی سیاسی تایبەت کە پێك دێت لە جۆرە یەکیتیەکی چەند پیکهاتەیی سەر بەناوەندیکی لاواز .

+ لە قاموسی حزبی بەعس: دانی پیانانێ ..[383]

+ بەشێکی تر لە فەرهەنگە عربیەکان هەمو ئەو تەقەلایانەی بۆ یەکگرتنەوەی وولاتانی عربی بە کۆنفدرالی وەسف دەکات[384] .

+قاموسە دەستوریەکان: کۆنفیدرالی لەنیوان دوو یان چەند دەولەتیکە بە پیی هاوپەیمانی وریکەوتن ، (نەك دەستور)[385] .

---

[382] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts -p90

[383] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص146

[384] القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3 ص1019

[385] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية –د احمد سعيفان ص279

**<u>ئەزمونەكانى كۆنفدرالى</u>** : ئەو شیوازەش بە پێی هەندی پێناس زۆر كۆنە، لە ئەزموونی نوێ دا سویسرە كۆن ترین سیستەمی فیدراڵیە،کەلە كۆنفیدرالی دەستی پێكردوە ، بەلام بەشێكی تر پێیان وایە ئەگەر ناوی كۆنفیدرالی نویٚ بێت، ئەوا ناوەڕۆكی نوێ نیە، بە هیچ جۆرێك لە داهێنانی ئەوروپی نیە هەروەك دەیانەوێ هەموو مۆدێرنیەكی ئیجابی بكەنە موڵكی خۆیان، هەموو ئەوانە بناغەی پەیامی هەیە، ئەگینا با سەرنج بدەینە شارستانی (ئەزدیل 1325-1520 پ.ز) چەند كۆنیشە و وەسفی لە لایەن زۆربەی فەرهەنگەكان بە كۆنفدراڵی كراوە سیستەمی ئیداری فیرعەونەكانیش لە كۆنفیدرالی نزیكە ، لە سەدەی 12 جاریكی تر هەندی نمونەی كۆنفدرالی (كۆمەلەی ئیرۆكواس) لەلای ئەمریكا باس دەكریت ، بەلام بەشیكی زۆری قەوارەی وا لە ئەزمونی حوكمی سەلتەنەو خەلافەتەكانی عەباسی وئەیوبی وعوسمانی بەدی دەكرێ كە كەمتر باسی لێكراوە ، زیاتر باسی ئەزمونی ئەوروپی كراوە ، زەقترینیان شانشینی ئەراگۆن (117- 1716) ، سویسرا لە نیوان (1291- 1848)...، بەلام بەپێی ستانداردەكانی دەولەتی مۆدیرن میژوی كۆنفیدرالی دەگەڕێتەوە پاش ویستیڤالیا 1648 لەدوای شەڕی 30 سالە نمونەی زۆر جۆراو جۆر لەسەر خاكی ئەلمانیای ئیستا دروست بوە ،بەشێكی زۆری وەبەرپێناسەی كۆنفدرالی دەكەوێ ،لەوانە ئەو قەوارانەی بێسەرۆك و پێش پێكهێنانی ئیمپراتۆریەتی پیرۆز لە 1806، بە هەمان شێوە ئەو هەمو قەوارەو میرنشینانەی پێش یەكخستنی ئەلمانیا لەسەر دەستی بسمارك لە 1871 ،هەندێكی ناویان لێنراوە وەك كۆنفیدرالی ڕاین(1806-1813) بەشێكیش ئەو ناوەیان هەلنەگرتوە .

هەندێ نمونەی تری پەرش وبلاوی تریش هەیە لەوانە: ئەمریكا لە نیوان (1781- 1789)،سربیا ومونتینیگرۆ(1781 – 1789)، سەنیگال وگامبیا(1982- 1989)، سربیاو مونتینیگرۆ جاریكی تر لە (2003-2006) ، لەگەل هەندێ نمونەی سەردەم كەلەدوای باسی دەكەین .

بەشیك (لەوانە خاوەنی قاموس السیاسی)زۆربەی تەقەلای یەككگرتنە عربیەكان بە كۆنفدرالی وەسف دەكات [386]، زۆر جاریش لە ناو ولاتانی عربی وەختیانە كراوە لەوانە: میسرو سوریا لەنیوان

---

[386] القاموس السياسي –احمدعطية الله ط3 ص1019 .

(1958 – 1961) ، دوای میسرو سوریاو عیراق له 1963/4/17بەناوی (كۆماری عربی یەكگرتوو)، هەروەها لیبیا لەگەل زۆر لا .

ئەوەی تیبینی دەكریت ئەزمونی سەركەوتوەكان كەمترە ،نمونەی سەركەوتوەكان ئەمریكاو سویسرایە كە لەدوای كۆنفدرالی بوونە یەك دەولەت ، ئەوە نیە بە موتلەقی شكستی هینابێت وەك بوویتە پاساوی هەندیك لە وولاتە دیكتاتۆریەكان ،لە ( قاموس حزب البعث) هاتوە : هەمو ئەزمونەكانی كۆنفدرالی وەختی بووینە بە خێرای ڕووخاوە یان وەرچەرخاوە بۆ سیستەمی فیدرالی و دەلێ ئیستا كۆنفدرالی هەر نەماوە[387]،هەرچی (قاموس السیاسی) پێی وایە زۆربەی جار هەنگاوی كۆنفدرالی بە ئاڕستەی فیدرالیە ،وەك سویسراو ئەمریكا لە سەرەتایاندا ، ڕەنگە نمونەی چارەنوسی ئەزمونی ئەمریكا لەهەموان ڕوون تر بیت ، هەلوەستەیەكی زیاتری( كەمیكیش لەوانی تر) لەسەر دەكەین:

1– سەرەتای دروست بوونی كیانی سیاسی ویاسایی ئەمریكا لە ئەزمونی كۆنفدرالیەكان دەست پێدەكات لەسەر دەستی دامەزرینەرانی ئەمریكا(هاملتۆن-مادیسۆن-جیفرسۆن-ج واشنتۆن) ئەو دوەی یەكەم بە باوكی دەستور ناوزەد دەكرین ،یەكەم جار لە نیوان (1861 - 1865) شەش ویلایەت لەسەر كۆنفدرالی ڕێك كەوتن ، دوای جاریكی تر 13 ویلایەت ریكەوتن لە سالی 1781ناوی نرا یەكیتی كۆنفدرالیەكانی ئەمریكا، بەندەكانی ڕیكەوتنی كۆنفدرالی ئەمریكی بریتی بوو لە نێوان 13 ئەو ویلایەتە كەبوە بناغەی دروست بوونی ئەمریكای ئیستا ، هەر ئەو ڕێكەوتنە بوە بەلگەنامەی سیاسی وولات تا دەستوری ئەمریكا لە 1788 ، هەر ویلایەتێك كۆمەلێك دەسەلاتی بۆ بە جێهێلدرا بەدەر لە دەسەلاتی كۆنگریس ،هەر ویلایەتێك دەنگێكی هەبوو ،دوای كۆنگریس بەرەبەرە دەسەلاتی دەرەكی وجەنگی **ودراو كاری هندیە سورەكان** زیادی كرد،دوای ریتچارد هنری و دیكنسۆن ڕەشنوسێكی فیدرالیان ئامادەكرد بۆ وەرچەرخان بەرەو دەولەتیكی فیدرالی هەمویان رازی بوون تەنها ماریلاند نەبێت ،لە 15 نوفمبر 1777ز

[387] تعریفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص146 .

کۆنگریس رازی بوو ، دوای ماریلاندیش له 1ی مارسی 1781 رازی بوو ئەو بەندانە یاساییانە بەرجەستە بوو ،..**وای کرد له سالی 1786** پیداچوونەوە بکەن ولە کۆبوونەوەیەکی دەستوری لە فلادلفیا1787کۆتایی بەو ڕێکەوتنە هات ودەستورنوسرایەوەو کۆنفدرالیەکەیان بەرەو فیدرالی بڕوات وئەمریکای لێهاتە بەرهەم .

2- کۆنفیدرالی نیوئینگلاند لە 1643دەست پیدەکاو پیکهاتبوو لە چوار کۆلۆنیالی ئەمریکی ( مساتشوستس، وپلیموپ، وکونتیکت، ونیوهافن).

3- کۆنفدرالی ڕاین لە 1806 ڕا دەست پیدەکات کە ناپلیۆن بەسەریاندا زال بوو ودوای لە پەیماننامەی پرسپۆرگ بەرجەستە بوو لە 16 ویلایەتی ئیستای هەریەکە بەسەرۆکایەتی میرێکی ئەلمانی تا سالی 1813 بەردەوامی کرد.لە سالی 1807 بۆ 1813 کۆنفیدرالی ویستیڤالیا دروست بووهەر لە ئەلمانیای ئیستا لە ژێر دەستی برایەکی ناپلیۆن (گیرۆم بۆناپارت) .

4-لە پیش یەکخستنی ئەلمانیا لە سالی 1871 لەسەر دەستی بسمارك ئەو ناوچەیە شیوە کۆنفیدرالی جیاجیا لێبوو ،سەرجەم ژمارەی میرەکان دەگەیشتە 1300 ،دوای لەو بەرواره لەو دۆخە وەرچەرخا بۆ فیدرالی وئەلمانیای لێدروست بوو، یەکەم پۆستی (ڕاوێژکاری)ش لەوساتیەوە هات .

5-پیش دروست بوونی هند لەسەر دەستی غاندی زیاتر لە 600قەوارەی شێوە کۆنفیدرالی هەبوو .

6-کۆمنویلسی پۆلندی و لیتوانی لەسالی 1791 .

7-کۆنفیدرالیە عربیەکان : لە مادەی (1)ی سایکس پیکۆ باس لە کۆنفیدرالی وولاتانی عربی کراوە ،بەلام تا ئیستا نەبوە جگە لە کۆمکاری عربی ،چەند تەقەلایەك دراوە ،لەوانە : لەماوەی (1958 تا 1961 )میسرلەسەر دەستی جمال عبدالناسر چەندین کۆنفیدرالی جارڕداو سەکەوتوو نەدەبوو ،لەسالی 1963 لەگەل سوریاو عیراق هاتەدی ،لەسالی 1971 لەگەل لیبیاوسودان ، جاریکی تر تەنها لەگەل لیبیا لە 1972 هیچیان بەردەوام نەبوو ،لەودواییەش چەندین تەقەلای وادرا زۆربەی لیبیا ئەو هەولەی دەدا ،هەندێ شیوازی کۆنفیدرالی هاتە دی بەناوی (جبهه الصمود والتصدی)و( جبهه المواجهه) ..زۆربەی لەکاردانەوەی ڕووداوێکی شکستی عرب دەهاتە کایەوە ، هەرەدواییەکەی لە سالی 1979 لە نێوان سوریاو عیراق کۆتایی پێهات بە پیلان ولە

سیدارەدانی کۆمەلیك سەرکردە ،ئەوەی سەرکەوتوو بێت کۆنفیدرالی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوە .

..زۆر نمونەی تر هەیە دەکرێ بکەوێتە چوارچێوەی کۆنفدرالی ئەگەریش ئەو ناوەی لینەنرابێت ،نمونەیەکی پیچەوانەی زەق بەرپا بوونی کۆنفیدرالی وولاتانی سۆڤیەتی پیشوو لەدوا ساتەکانی ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت ، ئەوکاتەی ئینقلابی شیوعیەکان کرا لە 1991/8/19 دژی بیرۆسترۆیکای کۆرباتچۆڤ ، دوای (3) ڕۆژ ئینقلابچیە شیوعیەکان پاشەکشەیان کرد، گۆرباتچۆڤیان هێناوە دەسەلأت بەبێ دەسەلأتی، پۆریس یالتسینی سەرۆکی روسیا ئەوکاتی رۆلی گرنگی بینی لە شکستی ئەو ئینقلابەو گێڕانەوەی گۆرباتچۆڤ (لە چوارچێوەی یەکێتی سۆڤیەت )، لە 1991/12/8 لە کۆبونەوەیەکی لوتکەی میژوویی ( بۆریس یا لتسین –سەرۆکی ڕوسیا، لیۆنید کراتشۆك-سەرۆکی ئۆکرانی، شوسکنیچ –ڕوسیای سپی ) کۆتاییان بە سیستەمی کۆماریەکانی یەکێتی سۆڤیەتی هێناو بڕیاری ئەوشسێوە کۆنفیدرالیەیان دا لەجیاتی سیستەمی کۆماری نیمچە فیدرالی بە رەسمی لە 1991/12/31 کەوتە واری جیبەجێ کردن،...ئەوەیان یەکەم جارە کۆنفدرالی لەناوەوەش دەبێت کە پیشوو تر هەر پیناسی ئەوەبوو چەند دەولەتێك لەدەرەوەو تەواو سەربەخۆ دەتوان کۆنفیدرالی ڕابگەیەنن .

<u>**ئەزمونی کۆنفیدرالی ئیستا:**</u> لە ڕاستیدا ئەوانەی دەلێن ئەزمونی کۆنفیدرالی زۆر وەختیە تاڕادەیەك ڕاستە ، بۆیە ئەزمونەکانی میژوو کەم بوە ولەباری ئیستاش یان هەر نیە یان ئەو نمونانەی باسی دەکەن ئەکتیڤ نیە ، لە باری ئیستاداچەند نمونەیەك لە پەیوەندی دەولی بە کۆنفیدرالی هەژماردەکەن ،هەریەکە بەکورتی باسیکیان دەکەین:

1-کۆمکاری عەرەبی:دەزگایەکی سیاسی نیمچەکۆنفیدرالیە لەسەر بنچینەی( ڕەچەڵەك ) ، وولأتانی عەرەب کۆ دەکاتەوە بە پلەی سەفیر،ژمارەیان 22 دەولەتە ، میژووی تەقەلای دروست بوونی دەگەڕیتەوە بۆ 7/ئۆکتۆبەر/ 1944 ، خاوەنی میساقیکی سالی 22/مارس/ 1945 پێك هاتبوو لە 20 مادە ، بەشیکە لە بەرجەستەی مەبەستەکانی سایکس پیکۆ ، وەك لەیەکەم جار لە

مادەی (1)ی سایکس بیکۆ پیشنیار کرا لە ژێر ناوی (کونفدرالیە الدول العربیە)) هەر لەوێش بڕیاری دروست کردنی دراوە .

2-کۆنقیدرالی فرانکۆفۆنیە : پێکهاتووە لەو وڵاتانەی کە بە زمانی فەرەنسی قسە دەکەن، یەکەم جار لەسالی 1880(ئۆنیسم رۆکۆلۆ)ی فرنسی ئەو زاراوەی داهێنا بۆ ئەوانەی کە لەجیهان زمانی فرنسی بەکاردەهینن،یەکەم کەسیش کە(ئەو زاراوەیەی) پەیڕەو کرد بۆ ئەو ریکخراوە ( لوبولد سیدار سنغور )ی سەرۆکی سەنیگالی بوو ، ئەوانەی لە بنەڕەتدا لەلایەن فەرەنسا داگیرکراوون، و بە پاکتاوی ڕەگەزی فێرە فەرەنسی بووینە، ، زۆربەی وڵاتە ئەفریقیەکانن، هەر تەقەلای ئەوانیش بووە هۆی دروست بوونی یەکیتی ئەفریقی ، لە 7/ ئەیلول/1961 وڵاتانی فرانکۆفۆنی یەکێتیەکیان پێکهێنا بەناوی یەکێتی ئەفەریکی مەلیگارسی(AMU.) ، ئێستا ( **50** ) وڵاتی تیایە، 7 وڵاتی عەرەبیە وبەشێکی ئاسیاوی و ئەوروپیش، ( فرانسۆ میتران ) ی سەرۆکی پێشووی فەرەنسا تەقەلایەکی زۆریدا ئەو ڕێکخراوە لە کەلتووری وفەرهەنگی یەوە وەرچەرخینیتە ڕێکخراوێکی سیاسی وزیاتر بەرەو کۆنفیدرالی بەریت ، تا ڕادەیەك هەندێ لە ئامانجەکانی هێنا دی ڕۆڵێکی سیاسیان لە پەیوەندی نێودەوڵەتی هەیە، بەتایبەتی لەبەرەنگاری ڕابوونی ئیسلامی لە وڵاتانی ئەفریقیا وەك لە جەزائیر ئەو ڕۆڵەی بە ئاشکرا بەرجەستە بوو، لەدوای کۆنگرەی 2002/10/20 لە بێرووت (عەبدۆ زیوف)ی سەررۆکی پێشووی سەنیگال بووە سەرۆکی فرانکۆفۆنیە لەجێی ( پترس غالی ) سەرۆکی پێشووی ( نەتەوە یەکگرتووەکان)، کۆمەڵێك بریاری سیاسیو ناسیاسی گرنگیاندا لەوانە لەبارەی( تیرۆر )، وەك تێبینی دەکرێت ئەو ڕێکخراوە لەوە (کۆنفیدرالیەکەی ) بەدی دەکرێ کە سەرۆکەکانی کەسێتی نێو دەوڵەتی بەهێزن .

3-کۆنگرەی ئیسلامی : ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی 1971 لە ( جدە)ی سعودیە دروست بووە، بەشێك ئەو هەوڵ و تەقەلایە دەگێڕێتەوە بۆ ساڵی 1954، خاوەنی ( میپاق ) ێکن، بەڵام هێزی جێ بەجێ کردنی لاوازە، وەك پاڵپشتی گەلانی موسوڵمان بۆ سەربەخۆی، هاریکاری ئیسلامی، قەڵاچۆی رەگەز پەرستی، بەکارنەهێنانی چەك و توندو تیژی بۆ کێشە ناوەکیەکان، .. لەهەر (3) ساڵێك کۆنگرەیەکی سەران دەکرێ نزیکەی(55) وڵات ئێستا بەشدارن .

4-یەکێتی ئەفریقی : لەساڵی 1963 لە ئەدیس ئەبابە دروست بوو لەلایەن (30) وڵاتی ئەو سەردەمی، هەندێ مەرجی مرۆڤانەو دپلۆماسیانە دارێژرا ، ساڵانە کۆبوونەوەیەکی سەرانی دەکا، لەبەر ئەوەی لە ئابلۆقەکەی سەر لیبیا ئەوانە زیاتر بەهانای هاتن نەك زانکۆی عەرەبی بۆیە لیبیا لە سەدەی نوێوە داخوازی ئەوە دەکا کە خۆیو وڵاتانی عەرەبی ئەفریقی زانکۆی عەرەبی هەڵوەشێننەوە و بچنە ڕیزی یەکێتی ئەفریقی ، بەلام لەدوای بەهاری عربی و دارووخانی رژێمی قەزافی ئەو گەلالەیە وەستا .

5-یەکیتی ئەوروپی لەدوای جەنگی جهانی دووەم لە1958لە روما بیروکەی ئەو یەکیتیە زیندوو کرایەوە بەناوی (کۆمەڵەی ئەوروپی )، لەدوای دارمانی شیوعیەت لە ساڵی1990 زیاتر بنەماکانی یەکێتی ئەوروپی بەرجەستە کرا لە ( واستریخ) و کرا بە ( یەکێتی ئەوروپی )، ئێستا دراویشیان یەکخست، کۆمەڵێك مەرجی مرۆڤایەتیو سیاسی تیایە بۆ وەرگرتنی هەر وڵاتێك لەو یەکێتیە، ی

ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو -مجلس تعاون الخليجي : لەدوای سەرکەتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و هەڵگیرسانی جەنگی عێراق – ئێران لە1980، ئەو ئەنجومەنە بەرەسمی دروست بوو، هەموو وڵاتانی کەنداو ( جگە لە یەمەن )ی تیایە، هەر (3) ساڵ جارێك ئەمینداری گشتی هەڵدەبژێرێتەوە، لە داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق ڕۆڵێکی گرنگیان گێرا بۆ گێڕانەوەی بنەماڵەی (صباح زادە )، هەروەها پێشتریش لایەنگیری عێراق کرد لەدژی ئیران و کوردیش..

6-کۆمنویلس بریتانی پیکهاتوە لە 53 وولاتی ژیر دەستی بریتانیا لەکاتی خۆی(جگە لە موزمبیق و ڕاواندا) ،تەقەلای دروست کردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم بەلام یەکەم جار لە جاڕنامەی ویستیمیندەری 1931 دەست پێدەکا، تائیستا بەردەوامەو سەرۆکەکەی شاژنی بەریتانیایە وسکرتاریەتێکی هەیەو دووسال جارێك کۆدەبنەوە .

7-کۆمنویلسی سەربەخۆ: پیکهاتوە لە 12 وولاتی هەلوەشاوەی جارانی سۆڤیەت کە لەدوای 1990 ەوە دروست بوون ، بریتین لە( ئەرمینیا، ئۆزپاکستان ،ئازەربیجان، ئۆکرانیا،روسیای سپی، روسیا، تاجیکستان،جۆرجیا،ترکمانستان،کازاخستان ،مۆلدیڤیا،قرغیزستان ) پایتەختیان لە مانشیکی روسیای سپیە .

کۆمنویلسی ئەمریکی بریتی بوو لەکۆنفیدرالی ئەمریکی لەنیوانی کۆمەلە دورگەکانی داریان لە ئۆقیانوسی هندی کە پیشووتر لەژیر سیستەمی وسایە بوو لەسالی 1990دەنگیان دا بەکۆنفیدرالی لەگەل ئەمریکا[388] .

لە ڕاستیدا ئەوانە زیاترلە هاوپەیمانی دەولی نزیك ترن نەك کۆنفیدرالی .

<u>جیاوازی لەگەل فیدرالی</u> :سەرچاوەی جیاوازیەکە ئەوەیە هەر لایەی کۆنفیدرالی تەواوی سەربەخۆیی خۆی هەیە کەچی فیدرالی ئەو پانتاییە سەربەخۆییەی نیە ، کەواتە فیدڕاڵی (یان ویلایەتەکان یان هەرێمەکان) شەخسیەتی سەربەخۆیی (نیو دەولەتی) لە دەست دەدەن بۆ یەك شەخسیەتی ناوەندی، لە بەرامبەریشدا (ناوەند) کۆمەڵێك دەسەڵاتی بۆ ئەوان بەجێ دێڵێ، لە کۆنفدراڵی وانیە، هەر یەکە شەخسیەتی دەولی دەمێنێ، جیاوازی کۆنفدڕاڵی و فیدڕاڵی و هاوپەیمانی ئاسایی ئەوەیە فیدڕاڵی گوزارش لە پەیوەندی یاسایی نێوان هەرێمێك و دەوڵەتی ناوەند (دەوڵەتی یەکگرتو) دەکات, هەرچی کۆنفدراڵیە گوزارش لە نێوان پەیوەندی یاسایی و سیاسی و ئابووری و... نێوان دوو دەوڵەت دەکا, هەریەکەیان سەرۆك و حکومەت ودەستوروهێزی چەکدار و تەواوی سەربەخۆی خۆی هەیە، زۆر جیاوازی تری هەیە بەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە:

1- دەولەتی کۆنفدرالی یان هەر جۆرە یەکگرتنێکی تری کۆنفدرالی شەخسیەتی دەولی دەبێت لەکاتیکا دەولەتی فیدرالی نیەتی .
2- پرۆسەی دروست بوونی کۆنفدرالی لە دەرەوە بۆ ناوەوەیە، کەچی فیدرالی لەناوەوە بۆ دەرەوەیە ،بە دیوێکی تر کۆنفدرالی لێکنزیك بوونەوەی چەندقەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆن کەچی فیدرالی لێك دوورکەوتنەوەی چەند قەوارەیەك لە ناو یەك دەولەت .
3- لە کۆنفیدرالی چەند <u>دەوڵەتێك</u> لەسەر بنچینەی سەربەخۆیی هاوبەش لە چەند ڕوویەك لە دەرەوە

---

[388] ئەو کۆنفیدرالیە زۆر بەکەمی ناوو زانیای لەبارەی هاتوە ،هەندێ زانیاری زیاتر لە :( الموسوعة الميسرة للمصطلحات ص354) بخوینةوة .

دا یەك دەگرن، هەرچی فیدراڵیە ئەوا یەکگرتنی چەند حکومەتێکە لەناو یەك دەوڵەت یەك دەگرن،

4- لە کۆنفیدراڵی دا بۆ هەر هەنگاوێك یان بڕیارێکی هاوبەش پێویستی بە کۆی دەنگی دەوڵەتە بەشداربووەکانە، کەچی لە فیدراڵی دا بەپێی زۆرایەتی دەنگی هەرێمەکان دێتە دی (بۆ زیاتر لەو جۆرە جیاوازیە سەرنج بدە: (کۆڤر، ئەدوارد- Amodern dictionary).

5-لە نیوان دوولا یان زیاتر پیك دێت کە هەمو سەروەریەکی یاسایی وسیاسیان هەیە کەچی پیکهاتنی فیدرالی لە چەند قەوارەیەکی ناسەربەخۆ پیکدیت .

6-مافی کشانەوەو تیکدانی هەیە لە فیدرالی ئەو مافەی نیە .

7-هیچ دەسەلاتیکی بەسەر هاوولاتیانی پیکهاتەی کۆنفدرالی نابیت ،لە فیدرالیا هەیەتی لە چوارچێوەی ئەو پانتاییە مەرکەزیەی کەلەسەری ڕێکدەکەون.

8-هەریەکە سەربەخۆیی تەواویان هەیە جگە لەکەمیك نەبیت (سەربەخۆیی ریژەیی) فیدرالی سەربەخۆیی ریژەی لەچوارچیوەی دەولەتەکە هەیە .

9-لەسەر جیبەجی کردنی بڕیارەکان ڕیك دەکەون و زیاتر ڕاسپاردە دەبیت لە کۆنفیدرالیا ، لە فیدرالیا ئۆتۆماتیکی بڕیارەکان جیبەجی دەکرێ لە چوارچیوەی دەستور.

چەند جیاوازیەکی تریش لە مافەکانی وولاتانی کۆنفدرالی بەدی دەکرێت کە لە دەولەتی فیدرالی نیەتی ،لەوانە :1- ئەندامی کۆنفدرالی هەردەمەك بیەوێ دەکشێتەوە 2-پارێزگاری (نیسبی)لە سەربەخۆیی 3-ناسنامەی هاوولاتیانی 4-جۆری حکومەتەکەی 5-شەخسیەتی یاسایی وپەیوەندی دەرەوەی 6-هەریەکە سەرۆکی خۆی هەیە ...

لە جۆرێکی تری دابەش وڕێکەوتنی کۆنفیدرالی عەرەبی هاتوە لە بەیانی (وحدەی میسری وسوری وعراقی) رۆژی 1963/4/17 لە ژێر ناونیشانی ( بناء الدولة الاتحادية واختصاصاتها ) واهاتوە :

1 ـ أن تقوم دولة اتحادية باسم (الجمهورية العربية المتحدة) على أساس الاتحاد الحر بين كل من مصر وسوريا والعراق وتكون أسماء الأعضاء بالدولة الاتحادية القطر المصري والقطر السوري والقطر العراقي.

2 ـ أن يكون لكل جمهورية عربية مستقلة تؤمن بمبادئ الحرية والاشتراكية والوحدة الحق في أن تنضم إلى هذه الدولة بإرادة شعبية حرة ويتم الانضمام بعد موافقة السلطة الدستورية في الدولة الاتحادية.

3 ـ أن تكون السيادة الدولية الكاملة للدولة الاتحادية.

4 ـ أن يكون لمواطني الدولة الاتحادية جنسية واحدة هي الجنسية العربية يتمتع بها كل من يتمتع وقت قيام الدولة بجنسية الأقطار الأعضاء وتنظم أحكامها بقانون اتحادي.

5 ـ أن تكون السيادة في الدولة الاتحادية للشعب يمارسها طبقاً للدستور.

6 ـ أن يكون الإسلام دين الدولة واللغة العربية لغتها الرسمية.

7 ـ أن يكون علم الدولة، علم الجمهورية العربية المتحدة الحالي وفيه ثلاث نجوم بدلاً من نجمتين وتزاد نجمة كلما انضمت دولة إلى الدولة الاتحادية.

8 ـ أن تكون عاصمة الدولة القاهرة.

**كۆنفدرالی کوردستان وعیراق پیشنیارکراو:** فۆرمی کۆنفدرالی هەر مەرج نیە لە دەولەتانەوە سەرچاوە بگرێت ،گەلێ جار شێوەی تری چارەسەری وەردەگرێ ، بۆ کیشەی دوونەتەوە یان پیکهاتە باس لە کۆنفیدرالی کراوە ، لەوانە تەقەلاکانی نەتەوە یەکگرتوەکان ولیژنەی یۆنیسکۆپ (تایبەت بە کیشەی فلستین) لە 1947 پیشنیاری دروست بوونی دەولەتیکی کۆنفیدرالی عربی یەهودی کرد پالپشت بە بڕیارێ 106 (جمعیە العامە) ، بە هەمان شێوە معمر قەزافی لە کتیبیك بەناوی (کتاب الابیض) هەمان چارەسەری پیشنیار کردو ناویشی لەو ولاتە نا (ئیسراستین) ، لەکۆتایی گەشەی کیشەی خوارووی سودان پیش سەربەخۆیی لەلایەن حسنی مبارەکی سەرۆکی ئەوسای میسر پیشنیارکرا کە دەولەتیکی کۆنفدرالی سودانی وجنوبی دروست بکەن ،...لەگەل زۆر نمونەی تر لەوانەش بۆ نێوان هەریمی کوردستان ودەولەتی عیراقی لە کۆن و نوێوە .

دوای سەرنەکەوتنی ئەو پەیوەندیەیاسایی وسیاسیەی هەریم لە نیوان 2008 تا 2014 کۆمەلیك گەلالەی نویێ لە چوارچیوەی مافی چارەنوس هاتە کایەوە، یەکێکیان کۆنفدرالی بوو ،بابزانین چەندە

بنەماو ڕیشەی هەیەو چەندیش چارەیە و ئاستەنگەکانی چین؟ دەتوانین زەمینەیەکی یاسایی بۆ کۆنفیدرالی کوردستانی وعیراقی بدۆزینەوە ؟

لە کۆنەوە هەندێ ئەزمونی کۆنفدرالی کوردلەگەل خەلافەتەکانی ئیسلامی ئەمەوی وعەباسی بەدی دەکرێ ، هەرچی ئەیوبیەکانە زۆر بالاتر بوون لەو ئاستە ، ئەوەی لە چوارچیوەی یاسایی بووبیت ،ئەو کۆنفیدرالیەیە کە لە ئەنجامی ریککەوتنی سولتان سەلیم وشیخ ئیدریسی بەدلیسی (سولتان — ەدلیسی)کە لە 1514زمۆر کرابوو وەك دوو دەولەت لە مادەی (4)و(ا) هاتبوو هەردوولا لە کاتی دەست درێژی دەرەکی یارمەتی یەکتر بدەن، نەك تەنها کورد ، ئیتر ئەوە بەندێکی بنچینەی سیستەمی کۆنفدرالیە ، لەوکاتیەوە تا کۆتایی عوسمانی پەیوەندی سیاسی ویاسایی لەگەل کورد3 دۆخی وەرگرتوە(جگە لە ئەیوبیەکان ئیمپراتۆریەك بوون) ، کۆنفیدرالی وەك ئەو 23 میرنشیتەی دوای ڕێکەوتنەکە ،دوەمیان سەربەخۆیی وەك دەولەتی سۆران ، سێیەم داگیرکاری بوە وەك قۆناغی کۆتایی عوسمانی لە دوای 1870 بە دواوە ،ئەو جۆرە پەیوەندی وکۆنفیدرالیە جیایە لەگەل دابەشی ئیداری عوسمانی کە بە شیوەی سیستەمی ویلایەت وئوستان دابەشی کردبوو ، دیسان کوردستان بە دوو دۆخ ئەو پەیوەندیەی بەرجەستە کردوە ،یەکیان لە چوارچیوەی ویلایات لەدوا قۆناغ ویلایەتیك بەناوی کوردستان ناوزەد دەکرد،لەشیوەی میرنشینیش ، میرنشینەکان لە ئەنجامی گەشەی ولایات پەیدانەبووینە وەك واباوە ،لەو ڕووەوە ڕەنگە کورد لە میلەتانی تر چالاك تر بووبیت بۆ خۆی ،لەو کاتەی ویلایەتی کوردستان هەبوو ویلایەت بە ناوی عربستان یان تورکمانیان چەرکەس ..نەبوە ، هەندێ لەناوەکانیان هەلدەبژێرین:(ولاية ايدن ،ولاية أضنة ،ولاية أنقرة، ولاية الحجاز ، ولاية ديار بكر ،ولاية سالونيك ،ولاية سيواس ،ولاية طرابزون ، ولاية قسطموني،ولاية قونية ،ولاية الموصل ، ولاية بغدا،ولاية بصرة ،ولاية بدليس ، ولاية بيروت ،ولاية حلب ، ولاية شام ، ولاية وان ، ولاية جزائر ابجة،ولاية طرابلس، ولاية دانوب، ولاية سلانيك ،ولاية بوسنة،ولاية قوسوة ،ولاية مناستر،ولاية ..)، ئەوە سیستەمی ئیداری عوسمانی بوە ، هەرچی میرنشینە کانی کوردی وعربی وتورکمانی ناوی جیاو پەیوەندی ئیداریەکەشی لەگەل عوسمانی وەك ویلایەتەکان نەبوو ،دەتوانین بلێین ویلایەتەکان نزیك بوون لە فیدرالی و میرنشینەکان نزیك بوون لە کۆنفدرالی . لەسەر ئەو بنچینەیە دەبینین دووڕای

جیای(حزبی تعالی وترقی کورد) تێدابوو یەکەمیان داوای سەربەخویی تەواوی بۆ کوردستان دەکرد دووەمیان کۆنفیدرالیەك بە ناوی جامیعەی ئیسلامی، بۆیە ئەو حیزبە نەیتوانی بەدروستی سەرکردایەتی شۆڕش 1925 کوردستانی تورکیا بکات.

جۆرێك لە کۆنفدرالی (کوردی وتورکی وئەرمەنی )لە پرۆژەکەی روسیاش بەدی دەکریت کەمێك پیش جەنگی جیهانی یەکەم ، لەمادەی یەکی لائیحەی (پرۆژەی چاکسازی روسی-22مادەیی) بەناوی (پرۆژەی پورتقالی ژ:50) ،ئەو پرۆژەیەی روسی لە1913/6/8 بۆ چاکسازی باری ئەرمەنی لە وولاتی عوسمانی جاڕدرا، پیکهاتبوو لە 22مادە (هەر مادەیەکیش لە شێوەی پاکیج دروست ببوو ) ، لەمادەی یەك ولایەتەکانی (ئەرزەرۆم-وان-خەرپووت – پەتلیس – ئامەد – سیواس )بۆ ئەو کۆنفیدرالیە دیاری کرابوو ،لە مادەی(2) والیەکی ئەرمەنی لەسەرووی هەر ویلایەتێك بێت ،لەهەمان کات سەرۆکی تەنفیزی ئەنجومەنی ئەو ویلاتەش دەبێت ،لەمادەی (5)ژمارەی ئەرمەن وموسولمان لەئەنجومەنی ویلایەت یەکسان بن ، لەمادەی (15) داکۆکی لەوە دەکا هەر فەرمان وبەیانێك بەهەر(3)زمانی (ئەرمەنی وکوردی وتورکی)بێت[389] ،،دوای بەشێك لەو چاکسازیە بوە ڕێکەوتنێکی روسی وعوسمانی بە مۆری(سعیدحلیم پاشای سەدری ئەعزەم وسەرکۆنسۆلی روسی (گۆلگڤیتچ) لەرۆژی 26/کانونیدووەمی 1914 .

دوای جەنگی جیهانی یەکەم و هەلوەشانەوەی عوسمانی لەسەرەتادا بیرۆکەی دابەشیەکەی رۆژهەلاتی ناوەڕست لەسەر بنچینەی کۆنفیدرالی بوە ،وەك لەمادەی (1) ( سایکس پیکۆ ) هاتوە :

**المادة الأولى :** (ان فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا أى دولة عربية مستقلة أو حلف دول عربية تحت رئاسة رئيس عربى فى المنطقتين (أ) - (داخلية سوريا)، (ب) (داخلية العراق) المبينتين بالخريطة الملحقة. ويكون لفرنسا فى منطقة (أ) ولانجلترا فى منطقة (ب) حق الأولوية فى المشروعات والقروض المحلية، وتنفرد فرنسا فى منطقة (أ) وانجلترا فى م نطقة (ب) بتقديم المستشارين

---

[389] روسیا –کۆنسۆلخانەی ئەستەمبۆل- (الکتاب البرتقالی رقم 50) ناوزەد دەکرا .

والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية) ، له جياتى كۆنفدرالی لێره به (حلف)هاتوه .

سەبارەت بە عیراقیش چەندین بیرۆکەی جیا سەری هەلدا لەسەرەتا زۆربەیان لە کۆنفدرالی نزیك بوو :

کۆنفدرالی هندی و ولایەتی بەسرە .

کۆنفدرالی عیراق و هند (ئەودوە پیشنیاری وەزارەتی موستەعمەراتی بریتانیا بوو )[390] ،

کۆنفدرالیەکی چوار هەریمی (بەسرە-بەغدا-موسل- فراتی ناوەراست) ؟

کۆنفدرالی (بەسرەو بەغدا) .

عراقی سەروو وعراقی خواروو [391].ئەوە نەخشە رێگەیەکی لۆرانس بوو بۆ ئەوەی عراقی سەروو (ولایەتی بەغدا) بۆ ملك عبدالله ،عراقی خواروو (ویلایەتی بەسرە) بۆ ملك زید ، ئەو کاتی ملك فەیسەل ببوە پادشای سوریە .

لەسەرەتادا بە جۆرە کۆنفیدرالیەکی تر هاتبوو هەروەك لەیەکەم تێروانینی بەریتانی-بەلگەنامەی ژ (7701 ـ B) بۆ هەمو ناوچەکەکە له1917/3/29 لەلایەن وەزیری هندی لە حکومەتی بەریتانی بۆ سکرتێرو نوێنەرە بەریتانیەکان لە عیراق تیایدا هاتبوو:

1ـ ئەوشوینانەی داگیرکراوە(لەفاوەوە) لەلایەن بەریتانیەوە بەرێوە دەچێت نەك هند.

2ـ بەسرەش لە ژێر حوکمی بەریتانیا دەبیت.

3 ـ لە بەغدا مەملەکەتێکی عەرەبی دروست دەکرێت و لە ژێر پاریزگاری بەریتانی خۆیان فەرمانڕەوا دەبن.

4 ـ ئەو حکومەتە عەرەبیەك لەسەروی دەبیت ولە ژێرەوە لە دەست بەریتانیا بێت وئەو پرۆژانە بگرێتە خۆی:

---

[390] تأريخ الوزرارات العراقية ج1 ص39.

[391] د.على وردى – لمحات من تاريخ العراق – قسم الأول –حول ثورة العشرين ج 5 ص 58.

أـ بەسرە وەك خۆی دەمێنێتەوە تا عەرەبی بە تەواوی جێی عوسمانی دەگرێتەوە.

ب ـ ئەو کارانە هەردوو ئەنجومەنی جێبەجێ کردن ویاسا دانان، سیستەمی باج وهندیەکانیش بە شێوەیەکی زۆر لەو مەملەکەتە بەکار نەیەت.

5ـ ئەگەر بەسرە نەکەوتە سەر بەغدا ئەوا ئیدارەی بەسراش بەند دەبێت بەو حاکمە بەریتانیەی لە بەغدا دەبیت.

6ـ کوێت وولآتە عەرەبیەکانی تری کەنداو تا عەمان سەر بە بەسرا دەبن [392].

7ـ ناوچە پیرۆزەکانی شیعەش سەربەخۆ دەبن.

8ـ هەرچی یەمەن وحەزرە مەوتە دەکەوێتە سەر وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی.

9ـ ناوچەکانی خواروی ئیران وعەرەبستان وفارس دەکەویتە سەر هند[393].

**لە نێوان کوردستان وعیراق :**جاریکی تر لە (وصایا وزاره الهند الی وزاره الخارجیه) دەربارەی سیاسەتی بریتانیا لە عیراق کەلە 22/کانون یەکەم/ 1920 لە مادەی(5) دەقەکەی بە کۆنفیدرالی نێوان کوردستان وعیراق وا هاتوە : **المادة(5) تؤكد فيها الدولة الكوردستانية اواتحاد مع العراق** .

لە ڕێنماییەکی تری ونستۆن چەرچل کە لە 1922/7/11 بۆ (بیرسی کۆکس)هاتوە دیسان پیشنیاری کۆنفدرالی دەکاتەوە ( ..فی حالة مشاركة الكورد فی الانتخابات العراقية يقام تشكيل اتحاد كوردستان مع المناطق العربية فی عراق موحد).

کەچی لە باشترین مادەی دەستوری دوای85 سال بە فیدرالی واهاتوە : دستور الجمهوريه العراقيه - 2005 **الباب الأول –المبادئ الاساسية**

**المادة (1): جمهورية العراق دولةٌ اتحادية واحدة مستقلةٌ ذات سيادة كاملة، نظام الحكم فيها جمهوريٌ نيابيٌ** (برلماني) **ديمقراطيٌ وهذا الدستور ضامن لوحدة العراق.**

---

392ـ ئەو بەلگەنامەیە یەکێ لە پاساوە یاسایی ومیژووییەکانی حکومەتەکانی عیراقە بۆ داواکردنەوەی کوێت.

393ـ بروانە:أ– موسوعة العراق السياس ص93 ب– تأريخ الإسلامي –محمود شاكر ص38–39 ج– كورد وكوردستان في وثائق البريطانية ص86–91.

لەو مادەیە گوزارشە لە فیدرالی کەچی ئەوانەی سەروو گوزارشە لە کۆنقیدرالی، چونکە لەوەی سەروو یەکگرتنی دووکیان ودوو هەرێمی جیا لەدەرەوە بۆ ناوەوە بوو ،کەچی لەو مادەیە پرۆسەکە لەناوەوەیە بۆ دەرەوە ، لە ریکەوتنامەی سیڤەر (کە وولاتانی ناوچەکەی پێدروست کرا) کوردستان و عێراق هەریەکە بە ماددەیەکی تایبەت لە عوسمانی جیابوەنەوە، کوردستان بە مادەی (63،)، عێراق بەپێی ماددەی (94) جیاکرایەوە، لەسەر ئەو بنچینەیە دەتوانین دروست بوونی عیراقیش وەك ئەمریکاو سویسرە ڕێز بکەین کە سەرەتا لە کۆنفیدرالیەوە دروست بوە ،جیاوازی ئەوەی عیراق ئەوەیە لە کۆنفدرالیەوە وەرنەچەرخا بۆ فیدرالی بەلکو بۆ سیستەمیکی ناوەندی توند .

(12)

## - **توندڕۆ** ( **پەڕەگر)** **(تطرف)** **EXTREME**

**ئەوانەش دەگریتەوە ( ئەحمسا ، ئوسولی ،غلو،بەهائی،متزمت،متشدد، ئیسلامفۆبیا ،هاوسەنگی .. اليسار المتطرف كاليمين المتطرف، (إشتراكيون الثوريون)، (المرعبون)، (ديناميتيه)، (إتحاد باكونين إيطاليا)،** (خلايا الثورية الفرنسية)،( فهد)، (فرسان الهيكل)، (جماعة جوبتير)،( السحر الاسود)، (جمعية قطاع الطرق)، (جماعة خصيان روسيا) ، ڕێکخراوی لەپ ڕەشەکان **،کۆمەلەی(کۆکلاس کلان)،** ڕێکخراوانی (الهاگانا،الهاشۆمیر،بالماخ..)، ایام العرب،دەزگای ڕاند ..

توندی زاراوەیەکی کۆنە بەلام لەسەردەمی نوێ ئەو ناوو ناوتۆرەی وەك (ئوسولی، متزمت، توونید، متطرف، تیرۆرست، ..) لەدوای شورشی ئیسلامی ئێرانی 1979 وڕابوونی نوێوە سەری هەلدا لەلایەن عەلمانیەتی دکتاتۆری ناوچەکەو دەسەلاتە جهانیەکان، ئەوەش زیاتر پالّی بە ئیخوان المسلمین نا زاراوەی (میان ڕەوی) هەلّبژێرن بۆ دروست کردنی ناسنامەیەکی تایبەت و جیا لە باقی بزوتنەوە ئیسلامیەکان کەناوی توندڕۆیان لێنرا .

بەڕای مەوسوعەی(Stanford Encyclopedia of Philosophy )یەکەم جار ئەفلاتوون پەرەگری فلسفی بەکارهێناوە، توندڕۆیی لە میانڕەوی ودادگەری دروست نابێت هەر لە پەڕەگری دروست دەبێت ،پەڕەگری لە فقها باس کراوە ، ئیمام ( ابن القيم)دەلێَ : (والعدل يحمله على اعتدال أخلاقه، وتوسطه فيها بين طرفي الإفراط والتفريط" فيحمله على خلق الجود والسخاء الذين هما توسط بين الإمساك والإسراف والتبذير، وعلى خلق الحياء الذي هو وسط بين الذل والقحة، وعلى خلق الشجاعة الذي هو توسط بين الجبن والتهور، وعلى خلق الحلم الذي هو توسط بين الغضب والمهانة وسقوط النفس ... وكل خلق محمود مكتنف بخلقين ذميمين، وهو وسط بينهما، وطرفاه خلقان ذميمان ... فإن النفس متى انحرفت عن التوسط انحرفت إلى أحد الخلقين الذميمين لا بد) [394].

---

[394] - مدارج السالكين ج2ص309

مەرجیش نیە توند ڕەوی هەر لە ئایدیۆلۆجیا قوولەکان وەبەرهەم بێت-وەك ئیستا زۆر دەگۆترێت ،جار وایە نەبوونی ئایدیۆلۆجیاش جۆرە توند ڕەوی وپەڕەگری دێنێتە ئاراوە ،تەنانەت دیموکراسیش پەڕەگری تێدایە وەك ئەرستۆ ناوی لێناوە (دیموکراسی پەڕەگر-EXTREME Democrasy )[395]،کەواتە توند ڕەوی لە علمانیەت و دەسەڵاتداران ...هەموی عەیە بیٚ ناسنامەیە ، ئەوانەش دەگرێتەوە کە گەلالەی سیاسی وبەرنامەو ئایدۆلۆجیایی پیٚ نیە ،بۆیە ڕوو لە توووند ڕەوی دەکابۆ مانەوەی دەسەڵات یان گەیشتنی بەدەسەڵات، لەوەوە ئەو وەسفەی (ابن خلدون)و(عمری کوری خەتاب)بۆ (عربیان)کردووە دەڵێن: زۆر دڕندەو بیٚ بەزەیین ئەگەر ئیسلامیان لەناو نەبێت، جمال بەنا دەڵی کۆمەڵگەی عربی پیش ئیسلام جگە لە (نەفامی )هیچ وەسفیکی تر هەڵناگریت ،چونکە هەر خەریکی قومارو خواردنەوەوڕێگری وتالان وپەلاماری لەخۆ لاوازتروکۆیلایەتی و..ئەوە ببوە بەشیك لە کەسیتی عربی[396]،کەسێتی توند شانازی بوە ،لەدوای خەلافەتی ئەمەوی جاریکی ترئەو کەسێتیە بە خویندنی تایبەتی بۆ کوڕەکانی خەلیفەو والیەکان دەرسی تایبەتی (ایام العرب)هەبوە کە نەفامی پەتی بوە، کەسێتی توندو خوێن ڕێژی بوە ،چەندە توندو خوێن ڕێژ بووبی ئەوەندە کەسێتی بەهێز وەسف کراوە ، لەوەوەدەردەکەویٚ ئەعراب و نەفامی و (ایام العرب) هەرگیز قەتیس نەماوە لە نێو کۆمەڵگەی بەدەوی ، لە ناو کوردەواریش شەوانە بەوە تەواو کراوە وەك لە (رسوماتنامەی ملامحمودی بایەزیدی) وادەڵێت، ئەو بەهایەی جەنگ وپەلامارو ستەم کردن شانازی نوسەرو ڕەوشەنبیرو شاعیرو هەمولایەك بوە،منهجی حوکم بوە، معاویە کوری ئەبوسوفیان نیوەی شەوەکانی بە (ایام العرب) بردۆتە سەر[397]، هەر لەوەشەوە دەتوانین لەو هەڵمەتانەی حکومەتی عیراق بەناوی ئەنفال کردی زۆر بە توند ڕەوانە دژ بە ژن ومندال وهەرچی ژیانە ،کەچی کاتیٚ ڕاپەڕین کرا نزیکەی 200000 سەربازو پلەداریو ، دەست هەبوو لەئەنفال وکیمیایی کەوتنە بەردەستی میلەتی کورد نەك هەر تۆڵەیان لێنەکردنەوە بەڵکو ڕێزیان گرتن ونانی مندالی خۆیان بەدەمی ئەو سەربازانە وەکرد، ئەوە مانای ئەوە نیە میلەتی کورد ئاریەو مەدەنیەو میلەتی عربیش سامیەو دڕندەیە وەك گۆپینۆو نیتچەو ئەلفرید و

---

[395] بروفیسور زکریا بشیر امام – التنویر والحضارة ص53

[396] جمال البنا –المرأة المسلمة بين تحرير القرأن وتقييد الفقهاء ص17

[397] بۆ پرسی زاراوەی (ایام العرب)بڕوانە : د عبدالستار جبیر- الهوية والذاكرة الجمعية ص11 وص18وص19

وای بۆچووبوون ،بەلکو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناسنامەی حزبی بەعس کە سۆشیالیستی ناشیۆنالیزمیە ودوورە لە ئاین ،میلەتی کوردیش زیاتر فەرهەنگی ئاینیان بەسەر زاڵە.

**زاراوە هاوتاکانی :** کۆمەڵێك زاراوەی تر نزیکن لە توندڕۆیی وەك( تیرۆر،پەڕەگری ، جەنگ ،شەڕانی ،گەف وهەڕەشە.. )،پیچەوانەکانیشی (ئاشتی ،میان ڕەوی ،عەقلانی ، نەرم ونیان، شۆڕشە سپیەکان ..) ئەوانە مانایان ڕوونە ،هەردوو زاراوەی (افراط)و (تفریط) هاوتای زاراوەی توندن هەریەکە بە ئاڕستەیەك ،بریتیە لە تێپەڕین لە ڕادەی خۆی چ زیادە چ کەم،بەجۆریك (التفریط) زیادەڕەوی بە ئاڕستەی سستی ،هەرچی (افراط) زیادەڕەوی بە ئاڕستەی ڕەقی زیادی ، لە ڕاسپاردەکانی (ئەبیکرات —بۆ پزیشکان) واهاتوە :(ولا یکون في مشیە مستعجلاً لأن ذلك دلیل علی الطیش ولا متباطئاً لأنە یدل علی فتور النفس )[398] ،لە قورئانیش (واقصد في مشیك )،مامناوەند(وسط) بریتیە لەنێوان هەمو ئەو زیادەو نوقستانیانە[399].

دەمێنێ زاراوەی (ئەهمیسا)ی هندی و (ئەمۆریالیزم)ی ئینگلیزی وشۆڕشە سپیەکان پەیوەستن بەو چەمکە ڕوون کەینەوە ،یەکەمیان واتە ئازارنەدان بەزمانی هندی(ئەهمیسا) واتە (ناتوندوتیژی)[400]، هەر لەو دەوروبەرەش مەزهەبی بەهائی سەری هەلدا کە باوەڕی بە جیهاد وتوندوتیژی نیە تەنها باوەڕی بە ئاشتی هەیە ، هەرچی دوەمە(مۆریالیزم) بە مانای ڕەتکردنەوەی هەمو جۆرە پرەنسیپیکی رەوشتی لە خزمەت مرۆڤ ونمونەی تری پەڕەگری لە تێڕوانین بۆ ناخی مرۆڤ ،شۆرشە سپیەکان بەو گۆڕانانە دەوترێ بێخوین ڕشتن ،وەك ئەوەی لە بوهاری عربی چەند زاراوەیەك بۆ ئەو ڕاپەرینە مەدەنی دوور لە توندو تیژی خەملی ، وەك ناوی (شۆڕشی یاسمین) بەو مانایەی شۆڕشیکی سپی وخوین ڕشتنی تیدانەبوو لەشیوەی شۆرشەکانی سۆڤیەتی پیشوو و جۆرجیا وئۆکرانیاو بەناوی شۆرشی گول وشۆرشی پرتقالی و نیلی وزۆری تر ، لە قاموسی حزبی بەعس رادیکالیایەتی وتوندڕۆیی پێکوە

---

[398] ابن ابی اصیبعة —عیون الانباء فی طبقات الاطباء ص28-29

[399] قاموس المصطلحات الاقتصادیة فی الحضارة الاسلامیة ص57 و ص74

[400] معجم مصطلحات عصر العولمة ص77

بەستوە ،(مذهب احرار المتطرفين) ی (ستيورات مل و بنتهام)لەو پۆلە ڕێز کردوە ، زۆر دژی ئیسلامی سیاسیو پرۆسەی بە سیاسی کردنی ئاینەوبەدوژمنیکی گەورەی ئامانجە نەتەوەییە عربیەکانی هەژمار کردوە[401] .

زاراوەی تەواو پێچەوانەی توندڕۆیی بریتیە لە شلڕەو ،هەرچی میانڕەویە بەدیلی توندڕۆیە نەك پێچەوانەی ،دووزاراوەش لێك نزیکن( پەڕەگری و توندی) ئەگەر هاوتای یەکیش نەبن ، پەڕەگرو.. (غلاە)و توونڕ ڕەو ... لێك نزیکن هەموو ئەوانە لەو ئەسڵە ئاینیە یان مەبادیئیە دوور دەکەونەوە (مذهبي صواب يحتمل الخطأ ومذهب الاخرين خطأ يحتمل الصواب)وەردەگەڕێ بۆ (مذهب صواب لايحتمل خطأ ومذهب الاخرين خطأ لا يحتمل الصواب)، جاریش وایە پەڕەگرو توونڕ ڕەوی لێك جیان ... پەڕەگری لە ڕاو بۆچوون و هەڵوێستی سیاسیە بەشی زۆر خاوەن بەرنامە ڕیشەیی وگۆرانەکانن ... بەڵام توونڕ رەوی لە کردەیە ...

لە بنەچەدا مەبەست لەو جۆرە زاراوەیە جیاکردنەوەی ئیسلامە لە ڕابوونی ئیسلامی,جیاکردنەوەیانە لە ئیسلامیکی میلی فراوان بۆ پانتاییەکی تەسك تر، گەلێ جاریش بە نیازێکی پاك هەندێ لە نووسینی ئیسلامیەکان جۆرێك لە یارمەتیدەری ئەو زاراوانەی وەك (ديموكراسي ئیسلامي)(سۆشياليستي ئیسلامي)(نەتەوەيي ئیسلامي)(وسطية الأسلام) (اسلام العنف).. لە ڕاستیدا (وسطية)سیفەتێکی ئیسلامە نەك ئیسلام هەبێت وەسەتی ئیسلامی و ناوەسەتی,یان ئیسلامی کراوەو داخراو ، ئیسلامی جیهادی و ناجیهادی, ئیسلامی ئاشتی و ئیسلامی نائاشتی, کەواتە دەکرێ بڵێین (موسوڵمانانی وەسەتی, موسولمانی داخراو،موسڵمانانی توند), ... ئەو ئاوەڵناوە نابێ بچێتە سەر خودی ئیسلام .

سروشت و پیناسەکانی: ئەوچەمکەزۆر کۆنە لە فقهی ئیسلامی بە (غلاە)نابراوە, مەبەستە فقهیەکە ئەوەیە گرتنەبەری زیاد لە پێویست, واتە لەو سنورەی بۆی دیاریکراوە ڕەتی دەدا کە هێشتا نۆرەی نەهاتووە یان لە سنورێکدایە هەر لە بەرنامەکە نیە, .... ئەو مەیل و دەردە زۆرجار لە

[401] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص66 ص158

نەزانی دێت لە ئەنجامی دڵسۆزی ، جاریش وایە موزایەدەیە وەك ئەو هاوەڵەی بە پێغمبەری ووت (اتق الله) ،جارێکی تر بەشیکیان نەچوونە شەڕی ڕۆم گوایە لەبەر فتنەی کچە جوانەکانی ڕۆم،جاریش وایەسروشتی خۆ دەرخستن و دەردە دەروونیەکانە, چونکە هەموو بوونەوەر بە ئەندازە و سنور دروستکراوە ئیتر مانای یاساو دانایی و زانایی و ئەوەیە لە سنوری خۆی تیَ نە پەڕییَ, (خلق کل شيً بالمقدار) .

لە ئەفسانەی یۆنانی کۆن باس لە سایك وتوندی پێکەوە دەکات ودەلێت :(دەروون، نفس- psych- سایك)[ببرشه] کچێکی خوای جوانیە (ئیرۆس) عاشقی بووە.. دوای شاردرایتەوە و هەموو خەڵك بەدوایتی[سمبرشه]...ئەوە وابێت هەموو خەلك نەفسانی وشەهوانی وئاژەلیو تەبیعات توندە ، ڕێك بە پیچەوانەی ئەوەیە کە (ابو حفص) دەیلیَ دەبیَ هەمو ڕێیەك لە دەروون ونەفست بگری و لە جیاتی سۆفیەکان دەلێت :(من لم یتهم نفسه علی دوام الاوقات ولم یخالفها في جمیع الاحوال ولم یجرها الی مکروهها في سائر أیامه کان مغرورا، ومن نظر الیها باستحسان شيء منها فقد اهلکها)[شمبرشه]، ئەوەدیانیش بە پێچەوانە ڕەت بوونە (افراط)ە،پەڕەگرە ، توندڕۆییە سەبارەت بە هاوسەنگی نێوان دەروون وژیان کە لە قورئاندا داوای کردوە .

لە فەرهەنگە رۆژئاواییەکان پێیان وایە یەکەم جار زاراوەی (توندڕۆ) لە دوای شۆڕشی فرنسا سەری هەلدا بەلای چەپی پەرلەمان ووترا ، ئەوانەی لە دەستە چەپی ووتەبیژ دادەنیشتن[لمبرشه] ، هەرچی (قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة) ئەسلەکەی بۆ ڕاستڕەوەکانی فرنسا دەگێڕیتەوە نەك چەپڕەوەکان ، دەلیَ بیرۆکەی چەپ وسۆشیالیست و لیبرالی بەتوندی لەلایەن (بەرەی نیشتمانی فرنسی) رەتدەکرایەوە و ودوای وەك زاراوە سەری هەلدا ، میانڕەوەکانیش ئەوانەن کە لە نێوان چەپ

---

[402] لە (موسوعە السوفیتیە ص231) روح ودەروونی یەکسان کردوە ،.. بەڵام ئەوە ڕاست نیە ،نفس لە سایکۆی لاتینی هـاتوە جیایە لەگەل روح.

[403] معجم دیانات و اساطیر العالم- ص151.

[شمبرشه] ابو القاسم القشیری- (الرسالة القشیریة في علم التصوف)، هەروەها بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة مصطلحات التصوف الاسلامي)-مادة-نفس، نفس الامارة،..

[405] .الموسوعة العالمیة : مادة تطرف .

و ڕاستی فرنسا کاردەکەن[406] ،لەموسوعە لالاند دەڵیت ئەو زاراوەیە زیاتر نیتچەو سۆریل بەکاریان هیناوە ،(بەکارهینانیکی هیز بەنایاساییی) لەئاینیش بەکارهینانی هیز بە ناڕەوا[407] .

هەرچی لە مەیدانی فەلسەفیدا ئەوا (Stanford Encyclopedia of Philosophy) دەڵیت سەدەی (5 پ ز) زاراوەی وا بۆ سەفسەتیەکان داتاشراوە لەلایەن (پرۆدیکۆس) هەمان مانای توندڕۆیی داوە ، لە میژووی فقهیش ئەو زاراوە کەمتر بەکار هاتوە ، سەرەڕای ئەوانەش ئەو زاراوە وەك لەخواروو دەردەکەوێ زۆر قوولە بەلای کەمی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ح ئادەم) و ئەو سزایەی پێی دراو دوایش لە نیوان قابیل وهابیل ڕوویدا ، لەسەر ئەو بنچینەیە بەزاراوەیەکی ڕوون وەسف دەکرێت ، بۆیەش مشت ومڕی لە بارەی پیناس و نیشانەو وەسفی زۆر نیە، ،بەلکو لەبارەی هۆکارو بوونە ئامراز مشت ومڕی لەسەر بوە ، بەسادەییەکەی هەمو شتێك لەناوەندیك دوولا پیك هاتوە ،ئەگەر لەناوەند نەبووی دەلێن پەڕەی گرتوە، هەندێ لە پێناسەکانی هەلدەبژێرین :

+فەیلەسوفی ئیسلامی (کورد)سیف الدین امدی باسی لەو بابەتە کردوە بەدەربڕینێکی فلسفی و بیرکاریانە باسی (رادەی هەرە سەروو —رادەی هەرەخواروو —ناوەڕاست) کردوە ،دەقەکەی واهاتوە: الوسط یکون بین الطرفین[408].

+معجم القرن21 : پێی وایە توندوتیژی هەر سەدەیەك جۆریك بوە ئەوەی سەدەی 21 توندو تیژی برسێتیە[409] .

+موسوعە لالاند : لە ڕووی لۆجیکیەوە بەوانە دەووترا پەڕەگر کە لەو پەڕی دوولاکەی (خالی ناوەڕاست) بووینە ،لە بیرکاری بە ئەوپەڕی بلند یان ئەو پەڕی نزم ووتراوە[410].

---

406 (قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة) —د احمد سعیفان ص404 وص408

407 موسوعه لالاند ج3 ص1554–1555

408 ا د عبدالامیر الاعسم — المصطلحات الفلسفیة للفیلسوف الامدی ص40 وص88

409 معجم القرن21 ص146

410 موسوعه لالاند ج1ص401

+د یوسف قرزاوی: توند دەکەویتە هەردوولای میانرەوی .

+ فارابی لە کتێبی (اهل مدینة الفاضلة) دەلێ : توندڕۆ ئەوەیە هەردەم خۆشی یان هەردەم داماویە نێوانی نەدۆزیەوە، لە شوێنیکی نری: توندڕەوی پیچەوانەی میان ڕەویە، میان ڕەوی لە نیوان دوولای توند ڕەویە ،نە هەر خۆشی ونە هەر ناخۆشیش[411] .

+ (دستور العلماء) : توند ڕەوی پەڕەگرتنە بەلایەك ، میان ڕەوییشدەکەوێتە نیوان دوو پەڕەگری زۆر نەرم وزۆر شل ، نزیکە لە ڕای (ابن سیناء) کە دەلێن: توند ڕۆیی تێپەڕینە لە دادگەری[412].

+مهاتما غاندی: غاندیش لە پو پیناسەی سەروو نزیك دەبیتەوە و دەلێ :دادگەری ئینجا نەمانی (توندوتیژی).

+ لە(تعریفات جرجانی) پێی وایە توندی ئەو پانتاییەیە لەدەرەوەی دانایی :(الحكمة هی هیئة القوة تحولیه العلمیة المتوسطة بین الجزیرة التی هی افراط القوة والبلادة التی هی تفرطها)[413].

+ د. محمد عمارەش لە کتێبی (معركة المصطلحات) دەلێ پەڕەگری وتوندی ڕەت بوونە لە دادگەری و میانرەوی .

+ قاموس المصطلحات الاقتصادیة ..: تێپەڕین لە ڕادەی خۆی چ زیادە چ کەم، مامناوەند لەنێوان هەمو ئەو زیادەو نوقستانیانە ،لەو قاموسەجیاوازی کردوەبەجۆریك (التفریط) زیادەڕەوی بە ئاڕستەی سستی و کەم بوون ،هەرچی (افراط) زیادەڕەوی بە ئاڕستەی ڕەقی وزۆری و زیادی [414] .

---

411بۆ زیاتر ستۆرنج بدة (موسوعة المصطلحات العلم الاجتماع والسیاسي فی فکر الاسلامی)مادة: الاعتدال

412موسوعة مصطلحات جامع العلوم ــ قاض نطیری.

413 تعریفات الجرجانی – ص54 .

414 قاموس المصطلحات الاقتصادیة فی الحضارة الاسلامیة ص57 و ص74

+ د حسن ترابى: هەر لايەنگيريەك بۆ دوولاى (ميانڕەوى )بەرەو تونديە لەهەمان كات تيكچوونى هاوسەنگيشە ،واتە توند ڕەو هەردەم ناهاوسەنگە[415] .

هەرچى پێناسى زاناو فەيلەسوفانى وەزعيە بە جۆرێكى ترە بەلام لە ناوەڕۆكدا نزيكن لەيەك ،هەندێكى هەلدەبژێرين :

+ ئەرستو لە كۆنەوە وتوويەتى : السياسة أهل الذراوة لاتستوى ولاتستقيم البتة الابالإضافة والهوات، بأن السياسة اهل الشرق لاتستقيم الابالكرامة والإحسان .

+موسوعە السياسيە: پەرەگرى ئەوحزبيانەن كە دەيەوێ 100٪ بنەماكان بەيەكجار جێبەجى بكرێت بە توندى .

+قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية : ڕاى فەرهەنگە ياساييەكان ئەوەيە توندڕۆ ئەوانەن كە كۆمەلگە وگەشە ڕەت دەكەنەوە ونمونەيەكى جيا گەلالە دەكەن وكەمايەتيەك لايەنگريەتى بۆيە ئامرازى توند بەكاردەهێنن[416] .

+**موسوعە الاسلاميە: مجاوزە حدالاعتدال**[417] .

+معهد السلام الامريكى :ئەوانەن كە كۆمەلە بيروڕايەكى ڕەتبوو لە سنورى سروشتى (پەڕەگر) پەيڕەو دەكەن[418].

+ (ابن سيناء) : توندڕەوى هەردەم لايەك لە تاريكى پيك دەهێنێ و (العدالة وسط بين الظلم والظلام) .

---

[415] **معركة المصطلحات** ص190 .

[416] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ص94 .

[417] الموسوعة الاسلامية العامة -اشراف: ا د محمودزقزوق ،قاهرة 2003 ص389.

[418] معهد السلام الامريكى (حل النزاعات بين الاديان) —مركز التعليم والتدريب-2008 ص 96 .

+ پیٚ ناسی (حکمه) له کۆنەوه له (تعریفات جرجانی) واهاتووه :(الحكمة هی هیئة القوة تحولیه العلمیة المتوسطة بین الجزیرة التی هی افراط القوة والبلادة التی هی تفرطها)[419]، ڕێك لەو پیناسه وادەردەکەویٚ توندڕەوی وپەڕەگر پیچەوانەی حکمەو داناییه .

+ هەروەها بن یوسف العامری له کتیبی (سعادة الإ سعاد)دەلی: سیاسەتی راست ئەوەیه لەسەر هەردوو تەوەری توند و نەرم، ترغیب وترهیب، بروا، وهەریەکەیان لەزەمان و زەمینی خۆی بەکاربهینی، ئەگینا هەر توند یان هەر نەرم سیاسەتیکی نادروسته.

توندی دەکەوێته پەڕگەیەکی (میانڕەوی)، ئەگەر میانڕەوی لەنێوان ئەو دوانەییانەی(الیساری الیمینی) (ثوری اسلامي) (رادیکال محافز) بێت ئەوا توندی هەردوو لاکەیه، **وەك د. محمد عماره دەلیٚ**: (الوسطية الإسلامية هو أنها عدل والتوازن بين قطبين، وليست انحياز لواحد منها ولا مقابرة التامة لهما ! انها الحق بين باطلين,, والعدل بين ظلمين، والإمتداد والتوازن بين تطرفين وغلوين)،ڕێك پیچەوانەی ئەو پێناس و وەسفه توندی وپەڕەگریه ، هەتا دیموکراسیش دەلێن دیموکراسی ودیکتاتۆری وەك یەکه له تیپەڕاندن و توندڕەوی،لەدیکتاتۆری نابێت کەس قسەبکات لەدیکتاتۆریش هەمو قسەدەکەن (ئیفرات وتەفریته) .

سەربردەی توندڕۆیی:

**زیاتر** لەو سەردەمه بەوانه دەووتریٚ که میان ڕەو نین یان دەلێن ئەوانەی دژی ئاشتین ،هەندیٚ جار به هەله (شۆڕشگێڕ)یان پیٚ دەوترێت ،هەندێك دەیبەستنەوه به (ڕادیکالی) لەوانه (موسوعه العربیه العالمیه) بەندی کردوه به چەپ وڕاست وڕادیکالی بیرو هەلس وکەوت ، ،تەنانەت گەلیٚ جار بەوانەش دەووتریٚ (توندڕەو)که زۆر پابەندی هەق ودادگەرین، یان ئەوانەی وەك خۆی بنەماکان جێبەجیٚ دەکەن،لەوانه .(موسوعه السیاسیه)پێی وایه ئەو ئەندام ولایەنگرانەی دەیانەویٚ بنەمای حزبەکەیان وەك خۆی(بێدەسکاری) جیبەجی بکەن بەهەر شیوازیکی توندیش بیت ئەوانه بەتوندڕەو هەژماردەکریت ،ڕاستیەکەی بەوانه ناووتریٚ توندڕۆ دەکریٚ (متشدد)ی بۆ بەکاربهێنی ، لێره بەڕوونی

---

419 تعريفات الجرجانی – ص54 .

دەردەکەویٚ (توندڕەوی وپەڕەگری وئوسولی) تیکەل کراوە کە لیٚکجیان ، مەرج نیەپابەندی بە کت ومتی بەرنامەو ئایدیۆلۆجیاو ڕیٚنمایی حزب وئاین ومەدرەسە سەلبی بیت هەمو دەم ،جاروایە ئەوە دلسۆزی ونمونەییە ، ئوسولییش هەمو دەم سەلبی نیە. ،جاریش وایە داگیرکەرو دەسەلاتی زۆردار بە بەرەی بەرگری وپیٚش مەرگەی رزگاری وتووە توند ڕەو، بە جاش و لایەنگیرانی خۆی وتووە میان ڕەو، ئینگلیز ناوی توند ڕەوی دابووە پال هەموو ئەو کوردانەی ئاواتە خوازی کوردستانیٚکی سەربەخۆبوون ،بەرابەرانی شۆرشی بیستی ئیراقیشیان دەووت توندرۆ،هەروەك بە عەرەبەکانی (فلستین) یش دەووترا تووندرەو، کەمتر بە یەهودیەکان ووتراوە ئەگەر چی زۆرداریش بووینە ، بەهەمان شیٚوە باری نیٚوان حکومەتی تورکیاو کوردستانی سەروو ،لەکاتیٚکا ناوی پەکەکە بە توندرۆ وەسفکراوە کەچی زیاتر لە 7 جار شەرِی یەکلایەنانە راگرتوە و حکومەت قەبوولی نەکردوە ، چەکدانانیشی قەبوول نەبوە ،مەرجیکی بۆ ئاشتی داناوە کەدەبیٚ هەمو چەکدارانی پەکەکە بچنە دەرەوەی سنوری تورکیا ،ئەو مەرجە نەبوەو نەدەبیت چونکە بستە خاکیك لەسەر ئەو زەویە نەماوە بیٚسیادەی وولاتیکی تر .

لەو سەردەمە زیاتر بەوانە دەوتریٚ توندرەو کە زولمیان لیدەکریٚ وجگە لەکاردانەوە بە گیانی خۆی وبە چەکی کۆنە چیتری لەدەست نایە ، کەمتر بەوانە ووتراوە توندرەو کە جار وایە مەیدانخوازی دونیایان کردوە بە هەرەشەی (یان لەگەلم بە یان دژمی) وەك ئەوەی ج بۆش لە جارِی جەنگەکەی دژ بە تیرۆر لە دوای 11/ی سپتمبری 2001 ز جارِی دەدا، هەمان دروشمی دارِشتەوە کە لە کیٚشەی کوبای1962 سەری هەلّدا ولاّتە بچوکەکانی کەوتنەوە ژیٚرهەرەشەی توندی ،ستالینیش دروشمیکی وای بەرزکردەوەو ووتی ئەوەی لەگەل ئیٚمە نەبی لەگەل ئەمریکایە —بەواتایەکی تر ئەوەی شیوعی نەبیٚت برجوازیە ، کاتی خۆی ئەرستۆش ووتویەتی هەرچی خاوەنی کۆیلە نەبیٚت خۆی کۆیلەیە[420] ، ئەوبالّە توندانە لەو سەردەمە پیٚیان ووتراوە(صقور) جارانیش پیٚیان ووتراوە (ئەهلی سەیف) خۆ ئەگەر دەسەلاتدار نەبن ئەوە پیٚیان دەووتریٚ توندرۆیانتیرۆریست،زۆرجاری ترئەوتوومەتە لەسەردەمی نویٚ زیاتر بۆ ئیسلامیەکان بەکاردیٚت بۆ جیاکردنەوە لە ئیسلامیە نەرمەکان، ئەو دابەشیەی میان رەوی ئیسلامی وتووند رەوی لە دوای شۆرشی ئیسلامی ئیٚرانی 1979 هات ، ناوی توند رەوی کەوتە سەر ئەو

---

[420] روسو- فی العقدالاجتماعی ص38 .

شۆرشه وهەموو ئەو بزوتنەوانەی له دوای ئەو سەریان هەلدا ،تەیاری (اخوان المسلمین) زیاتر ئەو زاراوه بەکاردەهێنن وخۆیان به تەیارێکی میان ڕەو دەناسێنن بۆ خۆجیاکردنەوه له تەیاری توندڕەو، هەرچەنده له کۆتایدا نەبوه شەفاعەت بۆیان وبەوانیش وا دەووترێ توندڕەو تیرۆریست ،به تێکڕاشیان دەووترێ ئیسلامی سیاسی. له سەر بنچینەی توندڕۆیی بزوتنەوه ئیسلامیەکان دەکرێنه سێ پۆلی سەرەکی:( پۆلێکی هەردەم زۆر توند، پۆلێکی هەردەم زۆر نەرم ،پۆلی سێ یەم هەردەم خۆی به نێوه ڕاستی هەردوولایه که دەبینی ) تاڕادەیەك ئەو دابەشیه بەو دیزاینه لەناو حزبه شیوعیەکان وزۆربەی دەستەوتاقمی ئایدیۆلۆجیه قوولەکان هەیه .

به ڕای زۆریك مسیحیەت دووره لەتوندی به پێی دەقی ئینجیلی مەسیحیەت زیاد له پیویست ئاشتیخوازو دژ به توندو تیژیه ،داوایان کردوه وەلامی توند به توندی نەدریتەوه ،(چاو بەچاو ددان بەددانیشیان ڕەتکردۆتەوه که له تەورات هاتوه (خر21: 24) ،چەندین دەقی ئینجیلی لەو بارەیەوه هاتوه ، بەلام بەشیکیش دەلێن ئەو دروشمەی بۆش له بۆش نەهاتوه بەلکو ڕیشەیەکی مسیحیەتی هەیه ،له ئینجیلی مرقس(9:40) واهاتوه : لأَنَّ مَنْ لَيْسَ عَلَيْنَا فَهُوَ مَعَنَا.- ئەوەی لەگەلمان نەبیت دوژمنمانه ،زاراوەی (ئیسنی)ش لەوەوه هاتوه ، سەرپەرشتیارانی (محاكم تفتيش) لەکاتی سوتاندنی نەیارەکانیان له ئاینی تر یان زانای بیروباوەر لەوان جیا دووبارەی ئەودروشمەی دەکردەوه (بواری لایەنی سییەم نیه ئەوەی لەگەلم نەبیت دوژمنه ) ،له ڕاستیدا هەندێ گروپی ئیسلامیش ئەوەی لەگەل ئەوان نەبیت بەدوژمنی لەقەلەم دەدەن هەتا ئیسلامیش بیت .

هەلبەته زانایانی ئاینی ئیسلام تومەتی (توند)ی سەر لەبن ڕەتناکەنەوه (جگە له ئیخوان مسلمین)،بەلام دەلێن ئیسلام به سروشتی خۆی توند نیه،هەروەك بنەماکامنی ژیانیش پەڕەگرو توندڕۆ نیه، بەلام میان ڕەوی مانای هەردەم نەرم وبێ دەنگ وبێ بەرگری نیه هەروەك (بن یوسف العامری )له کتیبی (سعاده الإ سعاد)دەلی: سیاسەتی ڕاست ومیانرەو ئەوەیه لەسەر هەردوو تەوەری توند و نەرم، ترغیب وترهیب، بروا، وهەریەکەیان لەزەمان و زەمینی خۆی بەکاربهینی، ئەگینا سیاسەتیکی نادروسته ، له مەیدانی فقهیشدا کەمتر ئەو زاراوەیه تاوتوێ کراوه ڕاستەوخۆ،لەدوایدا مانای لیکدرایەوه به پەڕەگرتن وجیگیر نەبوون له ناوەڕاست وڕەتبوون بۆ ئەوسەرو ئەمسەری نەرم

وڕەق هەردوولا بە پەڕەگرتن هەژمار دەکرێت ، یان زیادلە پیویست ،یان ڕەت بوون لە ڕادەی خۆی .. یان بەکورتیەکەی ئاودیو بوون لە سنوری ئاسایی خۆی ،بەو شیوەیە وەك (ئەسفەهانی) دەلیت هەرچی دادگەری نەبیت هەرگیز پەڕەگرە ،پەڕەگریش توندی بەدوا دێت .

**توندی لە میژوو و لە مەدرەسە جیاکان:** ڕاستیەك هەیە لەبارەی میژوو کەمتر گۆتراوە ئەویش ئەوەیە میژوو بریتیە لە تۆمارکردنی ڕووداوەکان،واتە میژوو هەمو ڕابووردووی ڕوومال نەکردوە ، ئەگەر ووردتر بۆی بچین ،میژوو تۆمارگای گۆرانی کۆمەلە ،دوو جۆر یاسای گۆڕان هەیە، **یەکەمیان** گۆڕانی هێمن و پلە بە پلە هەمیشەییەکانن، **دووەمیان** توندو تیژ و لەناکاوەکانن، یەکەمیان زۆرە و دائیمە بەڵام دووەم چ لە گەردوون چ لە سروشتی خۆمان نموونەی دەگەمەنی وەك: (ئەستێرە ڕەشەکان (الثقوب السوداء)، ئەستێرە نیوترۆنیەکان، سۆپرنوڤا، .... تا دەگاتە گڕکان و بروسکە و لافاو و تەقینەوەکانی تر و گەردەلول و زەمین لەرزین و تاڤگەکان و.... هتد دەشتوانین ئەو دوو گۆڕانکاریە لە ڕەوتی ڕووبارێك دەرخەین کە چۆن بە ئاسایی خۆی هێمنانە و پلە بە پلە دەڕوا بەڵام ناوە ناوە لە ناکاو دەبێتە تاڤگە و کۆمەڵێك گۆڕانکاری خێراتر دروست دەکا، ئەو نموونە پڕ بە پێستی مێژووی کۆمەڵیشە کە چۆن مێژووەکەی وا هاتووە بە گۆڕانکاری هێواش و چەندایەتی و پلە بە پلەی و پەیژەیی شان بەشانی گۆڕانکاریە چۆنایەتی ناکاو و توندەکان، جۆرەکانی جموجۆڵی ڕۆژانەی واقعی و کۆمەڵایەتی بریتیە لە گۆڕانکاری یەکەم، هەرچی گۆڕانکاری دووەمە (واتە توندو تیژەکان وەك: شۆڕشەکان و یاخی بوون و وەرگەڕان و جەنگ و تێك هەڵچونەکانە .. میژوو ئەوەی دوەمی تۆمار کردوە کەمتر بەلای یەکەم داچووە ،بۆیە میژوو وادەردەکەوێ بریتی بیت لە میژووی ململانی وەك مارکسیەت وای بۆچوە ، بەشیکیش دەلین هەتا ئەو بەشەی تۆماریش نەکراوە بریتیە لە ووردە ڕووداوەکانی زولم وزۆری ، کەواتە میژوو بریتیە لە تۆمارگای تاوەنەکان وەك ڤۆلتیر دەلیت[421]، لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کە میژوو زیاتربە توندو تیژی پڕکرایتەوە نەك بە دادگەری و هیمنی وتیکگەیشتن ، لەلای ئەگریگیەکان هۆی ئەوەی میژوو زیاتر بە توندو تیژی پڕکرایتەوە ئەوا دەرگای

---

[421] توینبی منهج التاريخ وفلسفة التاريخ ص70-

فتنەو توندی ئافرەتیك كردیەوەو بە جیهان شەیتانەكان بلاو بووینەوە [422] ، لای بابلیەكانیش ئەسل توندو تیژیە مادام خودی مرۆڤ لە رشتنی خوینی خواوەندێكیان هاتوە ، بەگشتیش واتیبینی دەكری ئەوەی مەیلی بەشەریە بەلای توندیە ئەگەر بۆی بلویّ ، لەئاینیش ئەو كاتە بەزەیی ونەرم ونیان ودوور لە توندی بوە كە پەیام زالبوە بەسەر دەروونی شەڕاوی مرۆڤ، ،زۆرجاریش بەناوی ئاینیش شەری ناڕەوا و توندوتیژی كراوە ، بۆیە پانتایی میژوو زیاتر توندی بوە نەك میانڕەوی ، هەرلەوەشەوە دەبینین زۆربەی خوایە دەستكردەكان زیاتر خوای توندوشەڕن كەمەك خوای نەرمو میانڕەوی هەبوویّ ،ئیناری خوایەكی میانڕەو لەسەرەخۆی بەشی كشت وكالی ژاپۆنیەكان بوو ، تیمیس خوای یاساو دادگەری یۆنانیەكان بوە، جحوتی خوای عاقلایەتی میسریەكان بوە ،رادمنتۆس خوای دادگەری‌و عەقلانی بوە دایكیشی ناوی ئەوروپا بوە،شالیمۆ خواوەندی خیر ی ئۆگارینیەكان بوە ، فۆرسیتی خواوەندی ئاشتی ئەسكندینافیەكان بوە ،كیۆپید خوای ئاشتی رۆمان بوە ،میترا خواوەندی دادگەری ئاریەكان بوە [423]. هەرچی خواوەندی توندو شەڕە گەلیّ زۆرە ،زۆربەی میلەتانی چالاك خوایەكی شەڕوتوندیان هەبوە وەك سەروەری ، (ئەشتار خوای جەنگی ئاشوریەكان بوو، خوای میلەتی ئەنكا ناوی ئانتی بوو هەردەم تووڕەو توند بوە، خوایەكی سۆمەریەكان بە ناوی ئانۆ لە شیوەی مانگای تووڕە ،ئۆدنیش خوای جەنگی ئەسكندینافیەكان بوە ،ئۆنیرۆس خوای جەنگی میسریەكانی كۆن بوە ، ئیرینیس خوای ئەگریكیەكان بوو بۆ تۆلەسەندنەوە ،ئیراناگی خوایەكی میلەتانی ژاپۆنی جەنگی بوە ،ئایسەر خوای جەنگی ئەسكنینافیەكان بوە ،ئەیسكۆلاب خوای چارەسەری نەخۆشی بوە بەلام هەر توندو تووڕە بوە لەگەل ئەگریكەكان، ئینۆ خوای جەنگی ئەگریكەكان بوو،تاسنۆپ خوای جەنگی حیسیەكان بوە ، پور خوای جەنگی ئەسكندنافیەكان بوە ، زبابا خواوەندیكی بابلیەكانی جەنگ بوە ،لاماشۆ ،مارس ،میرڤا مۆت،نینۆرتا ،یۆتیزلۆپۆ چیلی...ئەوانە هەموی خواوەندی شەڕو توندوتیژی بووینە[424] .

---

[422] قاموس الخرافات والاساطیر ص32 ،ص42 ، 56 وص57وص60 ،ص86 ص133،ص224،..

[423] قاموس الخرافات والاساطیر ص21،ص76،ص87،ص93 ص127،ص150،ص177 ص189،ص204 .

[424] قاموس الخرافات ةالاساطیر ص94 ص11.

زۆربەی نازناوەكانی سەرۆك وپادشاكان نازناوی توندو جەنگی بوە بەدەگمەن یەكەك نابینیوە نازناوی میانڕەو ئاشتی هەلگرتبێت ، ئەوە خەلیفەو سولتانەكانی ئیسلامیش دەگریتەوە ،جگە لە عمری كوڕی خەتاب نازناوی (عادل)ی هەلگرتبوو بەلام دوای ئەویشیان بە (فاروق)گۆڕی ،نمونەی سرودی نیشتمانی عوسمانی دووبارە داكۆكلی لە لایەنی (ئەهلی سەیف)دەكاتەوە نەك (ئەهلی قەلەم) ،باس لە قەلەم بەدەستی ناكا بەلكو باس لە شمشێر بەدەستی دەكا : فـي اليـــد درع .. في اليـــد خنجـر ..ئیتر پەلامارو كوشتار زیاتر ناوناوبانگی ئیمپراتۆرو سولتان وخەلیفەی بەرزكردۆتەوە ، خوین رشتن وسەر بڕین وەك ئەوەی تەیموری لەنگ دەیكرد خۆی لەسەری خەلیفەی موسولمانانی دا ،بە شانازیەوە دەلێت لە ژیانمدا خەلیفەی وا ترسنۆكم نەبینیوە كەلیمدا دوومەتر خوین فیچكەی كرد ، سەری (ح حسین)یان لە عیراقەوە بۆشام بەدیاری برد ،سەری چەندین ئیزیدیان لەسنجارەوە بۆ موسل بردەوە تەنها لەسەر نەدانی باج[425] ...،كەواتە دەگەینە سەرەنجامیكی مەترسیدار ئەوەیە توندوتیژی لە مێژوودا ڕەسەنە ، هەر خودی ئایەتی (اكثركم للحق كارهون) ئەو ڕاستیە پشت ڕاست دەكاتەوە بەلام لەهەمان كاتیش بە نەرێنی وەسفی (توندوتیژی)كردوە ، بۆیە ئەسلی ئاینەكان میانڕەویە هەتا بە ڕای سیكیۆلاریكی توندی وەك (هۆبز)یش دەلیٚ : ئەسلی ئاشتی لە ئاین هاتوە [426] .

زۆر جار هەولدەدریت هەندیٚ پاساو بۆ توندڕەوی دابتاشرێت بەلام ڕاستیەكەی بەكارهێنانی توندوتیژی چ لە لای تاقمەكان چ لە لای دەسەلاٚتدار زۆر سلبیە، مانای وایە ئەو دەستەو تاقمانە نوقسانن لە بنەماو بەرنامە و ئایدۆلۆژیا و زەخیرەی فكری،هەرلایەكیان بەكاری بهێنن دژ بەوی تر لەباری ئاسایی (واتە ئەگەر پیویست نەبیت) خێرا پەنا دەباتە بەر توندی، لەبەرامبەر ئەو بۆچوونە دەنگ هەلبڕینێك هەیەو دەلیٚ زۆربەی كۆمەل وتاقمە توندەكان سەر بە ئایدیۆلۆجیایەكی گەورەو شمولی بووینە بەتایبەتی لەسەردەمی ئیستا ، نمونەی هەرە زەقیشیان توندڕەوی ماركسی لە سەدەی 20 وتوندڕەوی ئیسلامی لە سەدەی 21، بە گشتی مێژووی 70 سالەی شیوعیەت سەرباری جەنگ و كوشتار و تۆقاندنی جیهان، ئەوا ڕەوشەنبیر و نەیاران و هەتا هاوڕێیانی خۆشیان نەك هەر

---

[425] السياسات والاثنيات فى العراق ص81 .

[426] توماس هوبز- اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص119

تۆقاندوە بەڵكو تیرۆر كردووە،لەهەمووی ترسناك تر كوشتنی ترۆتسكی بوو كە هاوڕێی لینین بوو ، وەك مدرسە تەواو باوەڕیان بەیەك لاكردنەوەی فكری و سیاسی هەبووە لە ڕێی توندوتیژی ، واتە پەیڕەوی توندڕەوی سیاسیان كردووە وەك بنەمایەكی ڕەسەنی شیوعیەت نەك تەنها ڕەفتاری شیوعیەكان، ئەنجلس كتێبێكی هەیە بە ناوی (دور العنف فی التاریخ)، ماركس ئامۆژگاریەكی بە ناوبانگی هەیە بۆ شیوعیەكان و دەڵێ(ئێوە ئیسلاحی مەبن توندو و شۆڕشگێڕ بن) واتە تۆقێنەر وتوندڕەو بن، لەكاتی جەنگیشدا بە ڕاشكاوانە تیرۆریش بە ڕەوادەزانن وەك (لینین)لە نوسینیكی بەناوی (بم نبدأ)دەلیت: (نحن مبدئیا لم ننكر الارهاب یوما ولیس في وسعنا أن ننكره. فهو عمل من العمال العسكریة یمكنه أن یكون صالحا تماما وحتى ضروریا في لحظة معینة من القتال)[427]، لە كۆتاییدا ئەو بنەمایەی باكۆنین لەو مدرسە خەملی كە دەڵێت (خێر لەوەیە: تێك و پێك شكاندنی چی واقعیەبە توندی)[428]،ئەوەش لەسەر بنچینەیەكی ڕەسەنی ماركسی و یاسای دیالێكتیەكان هاتووە، كە پەیڕەوانێكی زۆری (باكۆنین) هەبووە لە ئەوروپا لە شێوەی ڕێكخراو بە ناوی: (ارادة الشعب)، (إشتراكیون الثوریون)، (إنتقام)، (المرعبون)، (دینامیتیه)، (إتحاد باكونین إیطالیا)، (لجنة الثورة)، (خلایا الثوریة الفرنسیة)، (اشتراكیون الثوریون)،( فهد)، (فرسان الهیكل)، (جماعة جوبتیر)،( السحر الاسود)، (جمعیة قطاع الطرق)، (جماعة خصیان روسیا) تا دەگاتە شۆڕشی ڕەوشەنبیری ستالینی و دوایش ماوی، هەروەها لەو دوایەش خەمیرە سوورەكان لە كەمبۆدیا، ، ڕێكخراوی لەپ ڕەشەكان (كف الاسود)ی سڕبی*...، كۆمەلەی(كۆكلاس كلان)ئەمریكیی بوولە 1865 دروست بوولەلایەن نائان فۆرست لایەنگیری سپی دژ بەرەش پیست ودانیشتوانی ڕەسەن ودژ بە شیوعەتیش بوو لەو دواییە ، لەدوای دروست بوونی ئیسرائیل ڕێكخراوانی وەك(الهاگانا،الهاشۆمیر،بالماخ..)زەندەقی عربی بردبوو،لە ئەمریكاش تاقمێك بە ناوی(كۆكلۆس كلان) تایبەت دژ بە ڕەشپێست دروست ببوو ودەیتۆقاندن، دەزگاكانی سیا و موساد و KGB و میت و موخابەراتەكانی تر، لەپرۆتۆكۆلی(18-

---

[427] لینین —بم نبدأ -كتب في أیار (مایو) 1901 صدر في أیار 1901 في جریدة «الیسكرا»، العدد 4 .

[428] مبادی الثورة- پاكۆنین

* ئەو كەسەی ئەرشیدۆك وهاوسەرەكەی تیرۆر كردو جەنگی جیهانی یەكەمی پێ هەڵگیرسا ناوی پرانسیپ بوو سەر بە لەپ ڕەشەكان بوو.

حكماءصهیون) دەڵێت:( وەكیلەكانمان كارێكی زۆری تیرۆری ماقوولانەیان ئەنجام داوە)، لە پرۆتۆكۆلی(1)یش ئەو ڕێنماییە توندە هاتوە:(واذن خير النتائج في حكم العالم ما ينتزع بالعنف والارهاب، لا بالمناقشات الأكاديمية) ، جیهانیش پڕبوو لە وڵاتان و دەسەڵاتی توندڕەو وەك دیگۆلیش دەلیت تەنانەت دەرگای ئاشتیش بە هیزو توندی دەكریتەوە ›)..، ئیشوو تریش ستربردەی (محاكم التفتيش) و كوشتن و سوتاندنی زانایان بەناوبانگە ، لە پێش ئەوانەش لە ڕوسیا ڕێكخراوی نیهیلیزم- كە دروست كەرەكەی (تۆرچینۆف )بوو دژی ئایین و لە پەیڕەویدا كوشتنی ئاغاو برجوازی تۆماركردوە ، تا ئەو دواییەش شان بەشانی (ئۆرۆ شیوعیە)و (سۆشیال دیموكاسی)- (الوية الحمراء إيطاليا)، (خلايا المسلحه لاتحاد لشعبى الفرنسا)و سوپای سووری یابانی ،ڕێكخراوی (بادرمانیهۆف) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هەبووە- كە دامەزرێنەرەكانی: (ئەندریاس بادر و ئۆلریك فاینهۆف) چەپیەكی برجوازیش بوون، زۆر ڕەوشەنبیریش بوون چاكیش لە ماركسیەت گەیشتبوون ڕەسەنتر بوون لەوان، ئەوانە زیاتر لە دژی ئەو هەنگاوانەی ئۆرۆ شیوعیەكان دروست ببون .

...بەڵام لە ڕاستیدا ئۆرۆشیوعیەكان واقعیانە تر بوون بەو بەرنامە هێمنانەیان لە ئەورۆپایەكی دیموكراسی، لە فەرهەنگ وقاموسەكانیان ناوو نازناوی وەك : چەپی ساویلكە -لینین، لادەر، ..، دروشمی (اليسار المتطرف كاليمين المتطرف) ئەو باسە بوو لەلایەن شیوعیە میانڕەوكان كە زیانی چەپی توند وەك ڕاستڕەوی توندە ، لە ناو سۆشیالیستەكانیش بە ئاوێتەبوونی لەگەل ئایدیۆلۆجیای نەتەوەیی ئەوا سیستەمێكی ڕادیكاڵی ترسناك و تۆقێنەری لێ پەیدابووە وەك: تورانیەكان، نازیەكان، فاشیەكان، بەعسیەكان، نەژاد پەرستەكانی ترو ...هتد كاریگەریەكی زۆریان لەسەر جیهان هەبووە،

هەرچی مەدرەسەی لیبرال دیموكراسیە نەیشاردۆتەوە لایەنی واقیعی و مێژوویەكەی بریتیە لە داگیرو داگیركاری و ئیستعمار و خۆ پڕچەك كردن و تۆقاندنی میللەتان، خاوەنی دووجەنگی جیهانی دڕندانەن، بەكارهێنەری چەكی ئەتۆمی و كیمیایین لە یابان و ڤێتنام و كەمبۆدیا..،و بە كارهێنانی چەك و باروت و چەكی قەدەغەی تر لە لایەن ئەوانەوە بەكارهاتووە وەك گەشەی ئامرازەكانی توندو تیژی، چەكی ئەتۆمی و چەكی كیمیایی لە لایەن ئەمەریكا بەكارهات یەكەم جار، گازی ژاراوی لە جەنگی جیهانی بەكار هات، یەكەم فڕاندنی فڕۆكە لە لایەن فەڕەنساوە بەكارهات كاتێ سەركردەكانی

شۆڕشی جەزائیری فڕاند لەناو فڕۆکە لە ساڵی 1956 کە بۆ دانوستاندن لەگەڵ فەڕەنسیەکان بە ئاسمانەوە بوون ، زۆربەشیان بە بڕیار یاسای ڕەسمی و مەدەنی و دەنگی پەرلەمانی و دیموکراسیانە داڕێژراوە، بەلام ئیستا چاکسازی زۆر گەورەیان کردوە و بە ئاشتیانە دەست گۆڕی دەسەلات دەکەن ،پیویستیان بە توندی تیژی ڕاستەوخۆ ئیستعمار نەماوە .

لەو سەردەمەدا دوو بەشی سەرەکی لە تاقم و کۆمەڵە سیاسیەکان بە ناهەق پەنا دەبەنە بەرکاری توند، یەکەمیان: عەلمانیە نادیموکراسیەکان کە لە فکرو مەبادیئا قەلۆش بووینە دووەم هەندێ دەستەو تاقمی خاوەن مەبادیئو عەقیدەش کە بە چاکی لە دەست نیشان کردنی قۆناغ و واقیع نەگەیشتوون، ئەوانەش لە هەموو لایەك هەیە چەپەکان، ناشیونالیزمیەکان، ئاینیەکان، هەتا لیبرالیەکانیش ،ئەو جۆرە دەسەڵاتدارانە توندوتیژی بەکاردەهێنن بۆ پارێزگاری لە دەسەڵات لە ژێر ناوی جیاجیای یاسایی و دیموکراسی و بە ئازادی دەزگای داپڵۆسێنەری دروست دەکا زیندانی پڕ لە سیاسەتمەدار و نووسەر و ڕەخنەگر دەکا. ئا لێرەدایە زۆربەی ڕەوشەونبیرانی دڵسۆز دروشمەکەی بەوورد دادەڕێژن دەڵێن: بەکارهێنانی توندوتیژی ناڕەوایە چ بۆ گەیشتن بە دەسەڵات چ بۆ پارێزگاری دەسەڵات، لە ڕاستیدا هەندێ دەستە و تاقمی توندڕەوپاساوو فاولی گەورە دەدەنە دەسەڵاتدارانی جیهانی و ئیقلیمی و ناوەکیشی، ئەوەش لایەنێکی تری ئاڵۆزی کێشەکانە لەو جیهانە، هەڵبەتە پەنابردنی هەندێ دەستەو تاقمی بچووك لێرە ولەوێ بۆ توندوتیژی هیچ ئەسلێکی ئاینی رەسەنی نیە، بەلام ئەسلی فقهی وکەلتوری عربی هەیە ، چونکە ئاین ئەوەندە دەوڵەمەندە لە فکرو عەقیدە و ئایدۆلۆژیا و سیاسەت و نموونە، پێویستیەکی وای بە توندڕەوی نیە (لا اكراه في الدين) (فمن شاء فليكفر ومن شاء فاليؤمن) ئەگەر ئایین گۆڕین بە تۆبزی نەبێت چ بنەمایەك بۆ تۆبزی گۆڕینی فکر و سیاسەت دەمێنێ، کۆمەڵ و تاقمەکانی سەر بە مەدرسەی مەبادیئی هەردەم پێویستیان بە نێو میللەتە تا بەرنامەکەیان لێ ساغ بکەنەوە، ئەوەش کەشێکی ئارامی پێویستە نەك تۆقاندن و ڕاوەڕاو کە سایکۆلۆجیەتی خەڵك پێ دەشکێ و هیچ مەبادیئێك بە سروشتی وەرناگرێ، بۆیە لە مێژووی موسڵمانانداندا دەستەو تاقمی توند بە باریکی شاز هەژمارکراوە ، بەلام بوونیشیان هەبوە ، لەوانە بەشێك لە(خەوارجەکان- بەتایبەتی ئەوانەی پێیان دەووترا ئەزاریقە) یان (جەماعەتی شێخ الجبل) لە

خۆراسان ، ئەوە مانای ئەوە نیە میژووی دەسەلاتەکانی خەلافەت جێی شانازی بن وتوندوتیژی تیدا نەبیت ،بەلام کەمتر تاقم وکۆمەلەی توندسەری هەلداوە ،تەنانەت زاراوەی تونرۆیش تاوتویٚ نەکراوە ، زۆربەی سەرچاوەکان دەلێن ناوی (تطرف) لە شەرع نەهاتوە  بە ناوی تر هاتوە وەك (غلو-تنطع-تشدد-..، بەو مانایەی کە جیکەوتیکی ڕەسەنی لەویٚ نیە .

## هۆکارو سەرچاوەکانی

گەلیٚ پرس هەیە هەریەکەو دەیەویٚ لەخۆی دوور خاتەوە ولەملی بەرامبەرەکەی بشەتێنیٚ، لەئایدیۆلۆژیای شیوعیەت هەولدراوە زۆربەی چەمکە نەرینیەکان ڕیشەیەکی سەرمایەداری بۆ بدۆزنەوەو لە خۆیان دوور خەنەوە ،تەنانەت لە شۆڕشی نوێی کوردستان تەقەلایەکی بەهێز هەبوو کە پیٚ ناسی فاشی بدرێتە پالٚ سیستەمی سەرمایەداری، بۆیە راستەوخۆ نەدەبوایە بەحزبی بەعس بووتریٚ حزبێکی فاشیە دەبوایە بلێی رەفتارفاشی، چونکە(گوایە)حزبی بەعس سۆسیالیستیە ناشیٚ دیاردەیەکی سەرمایەداری وەك فاشی بۆ بەکار بهێنیٚ !.

لەو سەردەمەش دیسان کۆمەلێك دیاردەو چەمك هەیە بەزۆرەملیٚ دەیانەویٚ لەملی مەدرەسەی تر بشەتێنن، لەوانە توندو تیژی ویەکتر قەبوول نەکردن بە ئاشتی، لەراستیدا توندو تیژی بەندێکی گەردوونیە شان بەشانی گۆڕانی هێواش هەیە،چ لە سروشت وگەردوون چ لە ناوکۆمەلگە چ لە ناخی مرۆڤیش،وەك لەسەروو نمونەی (سوپەر نۆڤا، تەقینەوەی ئەستێرەکان، داتلێشانی ناوکی، ئەستێرە رەش و سپیەکان، گڕکانەکان، گەردەلول و زریانەکان، تاڤگەکان .... هتد)، بیٚ ئەوانەش ژیان دەوەستیٚ، لەنێو کۆمەلٚگەش ئاوا چۆن گۆڕانی هێواش پێویست ودائیمە گۆڕانی توندو تیژیش لەکات و دۆخی خۆی پێویستە وەك: بەرگری وشۆڕش و راپەڕین و هەلٚچون وزیندانی و لەسێدارەدان ..... ئەوانە بەشێکن لەژیان، لە بەرامبەریشدا دادگاو سزاو کاردانەوەبەتایبەتی بۆ تاوان باران بەشێکە لێیان ،ئەگەر تاوان بار و بکوژ ودز نەترسن ئەوانە تاوانی مەزن تر دەکەن، ئەگەر بەرگری زۆردارو داگیرکەر نەکەی ئەوا رزگارت نابیٚ، ...بەلاٚم هەموو ئەوانە ئەگەر لەزەمان و زەمین و بەپیٚ ی مەرجی خۆی بەکار نەهێنریٚ دەبێتە سەلبی، هەر وەك ئەو توندو تیژی و تۆقاندنانەی دەسەلاٚت بە کاری دەهێنیٚ لە پێناو پاراستنی دەسەلاٚتەکەی یان ئەوانەی دژی دەسەلاٚت لە پێناو گرتنە دەستی

دەسەڵات، کەواتە توندو تیژی هەموی سەلبی نیە تا سەرچاوەیەکی دەماودەست و لابەلای بۆ بدۆزینەوە ،بەلکو قوولە و سنوریکە لەچوارچیوەکەی پیویستە ،کە لەو سنورە ڕەتدەدات دەبتە دەرد ،کیشە ئەوەیە ئەوەی لە میژوو تۆمارکراوە زۆربەی جۆری دوەمە ، کەواتە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی توندو تیژی و ودوایش بۆ (توندڕۆیی) بەدوای ئەو زیادەیەین لە سنور نەك خودی توندیایەتی ، ئەوەش سەرچاوەی یەکەمی ناخی مرۆڤە ئینجا بەرجەستە دەبیت لە شیوەی پەیوەندی کۆمەلایەتی وئابووری وسیاسی و ئاینی و ..، دوەمیان زەمینەی کۆمەلگەو ئەو سیستەمەی لیّی پەیدا دەبیت ،بەگشتی ئاخۆ کۆمەلگەیەکی مادیە یان ڕووحیە ،لە یەکەما زیاتر بەرەو توندوتیژی وسەرهەلدانی تاقمی تونرۆو پەرەگرە ،لەدوەمیشا کەمتر، لە دوای ئەو گشتگیریە هەندیّ سەرچاوەی تایبەتیشی هەیە :

1. توندرۆ و فەوزا : لەو سەردەمەدا توندڕۆیی زیاتر لەو ناوچانە سەرهەلدەدا کە سیستەم رژیم تیکدەچی ونادادگەری وکاری دڕندانە جیی دەگریتەوە —بۆ زیاتر سەرنج بدە کتیبی :(ادارە التوحش)کەلەلایەن مونەزیریکی قاعدە دەرچوە بەناوی (ابوبکر ناجی)...دەردەکەویّ یەك لەسەرچاوەکانی دروست بوونی توندرۆیی زەمینەی فەوزاو یاسای نەفامیە .
2. توندڕۆیی لە زیادەڕەوی : لەدوای لەدایك بوونی هەر ئایدیۆلۆجیەك (یان ڕابوونی) بەشیك پەیدا دەبن کە رازی نابن بە شیوە ئارامی تەفاعولی ئایدیۆلۆجیەکە ،بەلکو مزایدە لەگەل هاوتاکانیان دەکەن و بە پالپشت بە دەقە ئەسلیەکان ،ئەو شیوازە هەمو بوارەکانی کۆمەلایەتی وئابوری و سیاسی وفلسفی و ئەدەبی و .. دەگریتەوە ، لە ئەوروپا ئەدەبی تۆلستۆی ویاخی بوونی تاقانە و بۆچوونەکانی سارتەر و ولیام جۆدین وماکس شتیرنی(خاوەنی نظرية تمرد الفردی).. زۆر لای تر جاڕی یاخیبوونیان داوە ، زیاتر ئەو مزایدانە لەبارەی ئازادی لە دوای شۆرشی فرنسی هات ، لەناو بیری شیوعیەتیش پرۆدۆن(خاوەنی دروشمی : الملکیە هی سرقە )لە بارەی دەولەتیش (حکم الانسان للانسان هو عبودیە) وکرۆپتکین وباکۆنین(تحطیم کل ماهو واقع خیر) و..تەنانەت باکۆنین منافسەی خودی مارکسیشی دەکردو زیاتر مزایدەی شیوعایەتی لە خاوەنەکەی دەکرد ، دروشمی گشتی فەوزەوی: نا بۆ ئاین ودەولەت وتەخت وخودا ) ، لەناو جیهانی فکری ئیسلامیش شیعە بەرامبەر سونە ،سونە بەرامبەر مەزهەبی تر ..لەباری ئیستادا سەلەفیەتی ئاینی بەرامبەر

هەموان مزایدەیەکی وادەکەن دژ بەهەموان .

3. توندڕۆیی وسروشتی جۆرێك لە مرۆڤ: ئەو جۆرە مرۆڤانەی ئارەزوویان زالە بەسەر عەقل و دەکەونە نیو ئایدیۆلۆجیایەك ئەوا سروشتەکەی لایەنە سەلبیەکەی ئایدیۆلۆجیا وەردەگری وتوندڕۆیی لیدەردەچیٚ .

4. هەلەشەی گەیشتن بە دەسەلات پەیوەندی ئایدیۆلۆجیای پەڕەگرو تیرۆر، کاتیٚ دەبینی ئەو بیروڕایانە لەناو کۆمەلگە بە سروشتی نایەتەدی پەنا بۆ توندی وتیرۆر دەبردریٚ ،

5. جیبەجی کردنی پرۆژەو بەرنامەیەك وەك لە حزبە سەرکردەکان(حزب القائد)....

6. هەندیکی تر پییان وایە قوول بوونەوە و پابەند بوون بە دەقی بنەمای حزبی یان ئاینی توندی بەرهەم دەهێنی .

7. کەم تیگەیشتن لە ئاین وزیاتر داکۆکی لە لق و بەشەکان دەکەن نەك ئەسل و.. زاهیریە لقیە وازی لە جوهرو ئەسل هیناوە

8-ناخی مرۆڤ(سایکۆلۆجیەتی) : ناخی مرۆژ هەموی وەك یەك نیە ، لە ئەفسانەی یۆنانی (دەروون، نفس- psych) کچێکی خوای جوانیە دوای شاردرایتەوە و هەموو خەلّك بەدوایتی..واتە هەموی بەدوای نەفسەو (ئەنانیە) ،ئیتر لەوەوە مرۆڤ هەردەم شەڕانی وتوند دەبێت ،لەکۆنەوەش ووتراوە ئەسلی مرۆڤ شەڕانیە چونکە : لە رشتنی خوینی خواوەندی بابلیەکان (کینگۆ)هاتوە ،خوینی ئەو خواوەندە مرۆڤی لیدروست کرا[429] ، لە ئەفسانەی کۆنی ئەگریکیش واهاتوە کە ئەسلی مرۆڤ شەڕو توندیە چونکە جاران شەڕو توندو تیژی لەلایەن خواوە لە ناو سندوقێك شاردرابۆوە کەچی ئافرەتێك بە ناوی (باندۆرا-گوایە یەکەم ژنی سەر زەوی) دەرگای سندوقەکەی کردەوەو جیهان ومرۆڤایەتیان کردە شەڕانی وتوندو تیژی[430] ، بە پیچەوانەش ئەهلی تەسەوف دەلێن (دەبیٚ هەمو کارەکانت پیچەوانەی دەروون بێت )[431]،لەوەوەش ئەوەنە شلڕەو دەبێت ژیان ڕادەوەستی ، ڕاستیەکەی ناخی

---

[429] قاموس الاساطير والخرافات ..ص189 .

[430] موسوعة العربية العالمية –المادة:اساطير هةروةها برِوانة : موسوعة مصطلحات النقدية ج1ص512.

[431] ابو القاسم القشيري– (الرسالة القشيرية في علم التصوف)، هةروةها بؤ زياتر سةرنج بدة (موسوعة مصطلحات التصوف الاسلامي)–مادة–نفس، نفس الامارة،..

مرۆڤ نەئەوەی یۆنانیەکەیەو نەئەوەی تەسەوفەکەیە ،بەڵکو لەهەردوولا پیکهاتوە ، أ- لایەنی دەروونیە (نفس) هەردەم ئارەزووی زاڵ بوون و دەست بەسەراگرتن و تێر نەبوون و سنور بەزاندن و خوازیاری زۆر و تەمەلوك و جنس و دەسەڵات و خۆ دیارخستن.. بەکورتی لایەنی سەلبی مرۆڤە (النفس الامارة بالسوء) لایەنی مادی و شەهوانیەکەیە کە زیاتر بەلای دڕندایەتی مەیل دەکا ب- عەقیدەیە، یان هەندێ جار بە (ئەخلاق) تۆماری دەکەن یان بەگشتی بە (عەقل)ی دروست دەری دەبڕن، لەدژی بەرەی یەکەمە، عەقڵە (یان عەقیدە) دەبتە هۆی ڕێ گرتن لەو داخوازیە بێ سنورانەی (دەروون)، ئەو دوو لایە نە، ئەو دوو دەزگا دژ بەیەکە لەناخی هەرتاکێك هەردەم لە جەنگێکی بێ دانوستانن بەشێوەیەك ئەگەر عەقڵی دروست بەتەواوی سەرکەوت ئەوا مرۆڤێکی میان ڕەوو ڕەووشتداری ئیجابی لێ دەردەچێ، ئەگەر دەروونیش سەرکەوت ئەوا مرۆڤێکی دڕندەی توندڕۆی سەلبی لێ دەردەچێ .

9–لەکۆمەلگەی سست،بەفقهوسیستەمیکی وەك دەولەتی سعودیە کۆمەلگەیەکی داخراوی دواکەوتوت پێدەدا ، هەربیریکی چارە بۆکۆمەلگەی واو لە نێو کۆمەلگەی وا ئۆتۆماتیکی بیری توند دەردەچێ .

10– ئایدیۆلۆجیە ئەکتیڤەکان : جار وایە خودی ئایدیۆلۆجیایەکە توندەو دەستەو تاقمی توندڕۆ بەرهەم دەهێنی وەك: مارکسی وتەیاری شۆڤینی نەتەوایەتی وئیسلامی سەلەفی وهەندێ تەیاری تریش ، جاریش وایە لە تەسك تیگەیشتن دیت لەو ئایدیۆلۆژیە،لەبەر گرنگی هەلوەستەیەکی تایبەتی لەسەر ئەو خالە دەکەین :

<u>سەرچاوەکانی ئایدۆلۆژیای توندڕۆیی:</u> لەسەروو تاڕادەیەك باس لە چۆنیەتی دروست بوونی توندڕۆیی مارکسی ومەدرەسە عەلمانیەکان کرا ، بەلام کەمتر باسی ڕوە ئایدیۆلۆجیەکەی کرا، لە ژێر سایەی شۆرشگێری خودی فلسفەی مارکسی ورۆلی گۆڕان بەهۆی شۆڕش وبە نارەسەنزانینی گۆڕینی ئیسلاحی زۆر بەزەحمەت لایەنی میانڕەوی شیوعیەت دەتوانێ ڕێ لە توندڕۆیی بگرێت ،دەتوانین بڵێین خودی ئایدیۆلۆجیای مارکسی خۆی توندە ،بە دیوێکی پیچەوانەش سروشتی ئیستعماری توندە نەك هەربە ڕوانگەی مارکسی بەلکو زانایانی تریش وای بۆچووینە وەك راینال ودیدرو لەبەشی (تاریخ

الهندين- 1770)[*] باسيان له ئيستعمارو كۆيلايەتى كردوە كە شێوەی هەرە توندو دواكەوتەيە ، بەهەمان شيوه ئايديۆلۆجياى نەتەوەيى توند دەبێت ئەگەر سروشتى نەتەوەيى (كە خۆى ئينتمايەكى كۆمەلايەتيە وەريچەرخينيەئايديۆلۆجى) يان ووردتر ئينتماى نەتەوەيى ستونى وميراتيە كەدەيكەيە ئايديۆلۆجيا ناچار ئەو ستونيە وەردەچەرخينيە ئاسۆيى و ميراتيەكەش بۆ (موكتەسەب) وئيتر لەسەر بنچينەى بەهاى نەتەوەيەك جهانبينيەكەى دارێژێ ،سەرەنجاميكى لۆجيكيە بزوتنەوەو تاقمى توندى وەك شۆڤينى وتۆرانى و نازى وفاشى وفالانژيسى وبەعسى و ..دروست بێت ، بە حوكمى لاواز بوونى هەردوو تەيارى سەروو(ماركسى و ناشيۆنالى) ولە بەرامبەردا گەشەسەندنى ئايديۆلۆجياى ئاينى ،ئەوا زياتر تيشك دەخەينە سەر ئايديۆلۆجيەكانى ئاينى كە بريتين لە :

1- :لەدەقەكان پشت بە ئايەتەكانى (قتال)دەبەستن

2-لە زانيارى قورئانپشت بە تفسيرى(تجزيئى)دەبەستن نەك تفسيرى (موزوعى).

3-لەفقهدا پشت بە فتواكانى ئيمامى احمدى بن حنبل و ابن تيميه ومحمد كوڕى عبدالوهاب و زانايانى ئێستاى خەتى سعودى دەبەستن نەك بە زانايانى تر .

4–تێڕوانينيان بەرامبەر غەيرە دين ،زۆر حەديە (يان لەگەڵى يان دوژمنمى ) ،هەروەك ئەرستۆ وو ووتبووى هەمو مرۆڤەكان يەكسان نين و وەك دەمى شانە نين ليرەش ئيبن قيم لە (أحكام أهل الذمة) هەمان بۆچوونى هەيە لەسەر بنچينەى موسولمان بوون ونەبون ودەلێ : (فإنَّ قياس الكافر على المسلِم من أفسد القياس..." فإن الذِّميَّ يُستحق عليه القصاص، ولا يَستحقُّه هو على المسلم، ويُستحَقُّ عليه حدُّ القذف ولا يستحقه، وكذلك المُطلِّق في مرَض الموت يُستحق عليه الميراثُ ولا يستحقه، وكذلك المسلِم يَستحق تعليةَ البنيان على الذِّمي ولا يَستحقه الذميُّ عليه، والمسلم يستحقُّ نِكاح الكافرة وشراء الرَّقيق الكافر، ولا يستحق الذمي نكاح المسلمة ولا شراء الرقيق المسلم، والمسلم يستأجر الكافر للخِدمة دُون العكس...)[432]، بەو فتوايەو كۆمەلێك فتواى تر هەيە زەمينەو دەروونێكى پڕ

---

[*] - L'Ablé Raynal : Histoire philosophique et politique des établissements et du commerce des Européens dans les deux Indes وقد أعتبر هذا الكتاب، الذي طبع عدة مرات وبلغات عديدة، إنجيلا للمعادين للاستعمار، وفيه نقرأ مثلا ، "لم يسبق للنوع البشري بصفة عامة ولشعوب أوروبا بصفة خاصة أن عرفوا حدثا يمثل تلك الأهمية من الفعل الاستعمار، لأن الاستعمار جاء نتيجة الرغبة في الاغتناء وصَاحَبَهُ دائما العنف، فإنه لا يمكنه أن يُحَضِّر أحدا".

[432] ابن قيم الجوزية – أحكام أهل الذمةج1ص596 – 597 .

له ڕق وقینت پیشوەخت بۆ دروست دەکا ، وای لێدێت ئەسل رق بێت توند بن بەرامبەر مرۆڤی تر .

5-سوود لەزەمینەی ئیسلامی سیاسی کاریگەر بە (عەقلی عروبی)وگوتارو وانەی ئەو مزگەوتانەی کە مامۆستایانیان هەمان کاریگەریان لەسەرە , سوود لەسەلەفی ناجیهادیش وەردەگرن بە هەموارکرنیکی سادەوە .

6-ئەو ئیجرائەتە توندانەی بەرامبەر ئیسلامی دەکریت بە تایبەتی لە وولاتانی عربی وبوار نەدان بە دیموکراسیانە وئازادیانە کارکردنیان ..لەبەرامبەردا توندی بەرهەم دێنێ ، ئەو دۆخە هەر بۆ ئاین نیە لە ئایدیۆلۆجیەکانی تریش ئەو هۆکارە لێی کاریگەرە ، نمونەی برنشتاین کە سۆشیالیستیکی میانڕەو بوە لە ئەلمانیا بەلام بسمارك لەلە سالی 1878 ئەو حزبەی هەلوەشاندۆتەوە و برنشتاینی لە وولات دوور خستۆتەوە بۆسویسرا، دوای لەویش لە گەل کاوتسکی دوور خراینەوە بۆ بریتانیاو بوە هاوڕیی ئەنجلس ، لەوێ بەرەو مارکسی وتوندی ڕۆیشتوە[433] .

7-سەقەتی مەنهەجی تعلیم و بوونی گەندەڵی وچینایەتی وبێ سەرو بەری وشکستی شارستانی و سیستەم سیاسی وولاتانی ناوچەکە

.8- دژایەتی ئاین وپەیڕەو کردنی عەلمانییەکی توندڕەو لەبەرامبەردا ئیسلامی توندڕەو بەهەم دەهێنێ .

9-توندڕۆی ئاینی دەلێ ئایەتەکانی ئاشتی (لااکراە فی الدین) نسخ کراوەتەوە .

10-توندرۆ ی ئاینی بەرامبەر(ناتوند)ی ئاینیش توندە، لەشەرو ململانێشیان بەسەر بالە نەرمەکەی هاوتات زیاتر زال دەبی ، چونکە ئەوەی نەرمەکە دەیان لیکدانەوەی دوودلی هەیە بۆ بەرامبەرەکەی کەچی توندەکە بیدوودلی شەڕی دەکا ،دوا نمونەی زۆر دەگمەن نیوانی داعش وقاعیدە یە .

11-میانڕەوی پێیان وایە هەمو شەریعەت هۆکاری یاسایی هەیە لەناو کۆمەلگەو سروشت ،لەوێ بەرژەوەندیەکانی گشتی دێتە دی ،کەواتە بەرژەوەندی گشتی ڕاستەقینە شەریعەتە ئەگەر

---

[433] بۆ ئەو سەربردەیەی برنشتاین بروانە : معجم المؤلفات السیاسیە ص183 .

نەشووترابێت ،وەك ( ابن عقيل) دەلێ :(السياسة ماكان فعلا يكون مع الناس أقرب الى الصلاح وأبعد عن الفساد، وان لم يضعه الرسول ولا نزل به وحي..)[434]. لەوەوە زەمینەیەکی میانڕەو وعەقلانیت پێدەدا ،هەرچی تەیاری توند ڕەوە دەلێ شريعەت وەك تبليغ هاتوە علەی ناوێ یەکسەر جێبەجێی بکە بێئەوەی بیر لە زەمینەی جێبەجێکردنی بکەیەوە ..لەوەوە سەرکردەو کەسانی توندت بۆ بەرهەم دێنێ .

**ناسنامەو نیشانەکانی** : توندڕۆی ناسنامەیەکی دیاری کراوی نیە ، لە هەمولاومدرەسەیەك هەیە ،ئەوەندەیە بۆ هەژارەکان دەووترێ (توندڕۆ) بۆ دەسەلاتدار دەووترێ (صقور) ، بەلام نیشانەی هاوبەش هەیە لەنیو هەمویان ، بازۆر لیکدووریش بن ، کەواتە (اليسار المتطرف كاليمين المتطرف ) بنچینەی خۆی هەیە، نزیك لەوە لە فرنسا بەوپەرلەمانتارانە ووتراوە نیوەندگیر (سنەتەریەکان) کە لە نێوان چەپی توندو وڕاستی توند لە دادەنیشتن[435]، زۆربەی هەلەوتوندی مدرسە وئایدۆلۆژیاکانی ترە (کەزیاتر لەژێر کاریگەری مروڤە )ئەوا لەوە دێ لایەك زیاتر دەگرێ بە پیێ ی (عەقلی کورت بینی) مرۆڤ وناتوانێ ئەو ستاندەرانە بدۆزێتەوە بە جۆرێك یان توند ڕەو دەبێت یان پەڕەگر دەبێت، دەبینین لیبرالیەت ئازادیەکی بیێ سنور دەداتە تاك، شیوعیەتیش هەموو ئەو ئازادیەی ستاندۆتەوە، .. لەو لایە دەبینین مسیحیەتی ئێستا زۆر لاهوتیە، زۆر نەرمە، هەمووی لێ بووردنە، هەمووی قیامەتیە ... کەچی یەهوودی زۆر توندە دەبینین ئاینی ئیسلامی ڕاستەقینە (دوور لە هەلس وکەوتی موسولمانان) میان ڕەوە لە نێوان ئەو دوو تێپەرینەو بریتیە لە: ئازادی بە سنور، دنیایی وقیامەتی، روحی مادی، لێ بووردەی وسزا، یان بە گوزارشێکی هێگلیانە: ئاینی یەهودی تایبەتTheses ،ئاینی مسیحی دژیuntiThesesکە ئیسلامیش هات ئەوا syn Thesesواتە نێوانی

[434] ابن قيم الجوزية - الطرق الحكمية ص17

[435] معجم مصطلحات عصر العولمة ص76 .

هەردووکیان[436]،علی عزت بیکۆڤیجیش له (الإسلام بین الشرق والغرب)هەمان ڕەئی دووباره دەكاتەوه .

بەگشتی مەدرەسەی بەشەری و فقهی بەشەری بۆ ئاین له توندیا لێك نزیك دەبنەوه ، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینه ماركسی زۆر توند لەگەل ئاینی زۆر توند لەزۆر خال یەكدەگرنەوه ، نمونەی باكۆنینی و ئیسلامی هەره سەلەفی ، هەردوولایان كۆكن لەسەر (تحطیم كل ماهو القائم خیر)  با ئەو دروشمه بۆ (باكۆنین)یش بگەڕێتەوه ،بەلام هەریەكه بە جۆریك باكۆنین و ماركسیه توندەكان دەیان ووت هەمو شارستانی رۆژئاوا لەسەر فەرهەنگی برجوازی بنیات نراوه دەبێ تیك وپێكی بشكینین و فەرهەنگی پرۆلیتاریا دارِێژین ، ئیسلامی توندیش دەلێ ئەو شارستانیه لەسەر بنچینەی كوفر بنیات نراوه دەبێ تیكی بشكینین ولەسەر بەهای ئاینی شارستانیەتیكی تر بنیات بنێینەوه ، بەو شێوه له زۆر لای تر پیك دەگەن ودەتوانین كۆمەلێك نیشانەو پانتایی هاوبەشیان بەو شێوەی خوارەوه بدۆزینەوه :

1-هەردەم توندرۆ كەمایەتین : له پیشو باسی ئەوەمان كردكه له 3 بەشەكەی پۆلینی عەقلی زۆرایەتی له توندیدان،بەلام ئەوەش مانای ئەوه نیه مادام میانڕەو نەبیت یەكسەر توندڕەوە ،نەخیر دەبی ئەو كەسانه خەلكی بزیو بن،ئەو مەرجه وادەكا توندڕۆ له كۆتایدا كەمایەتی بن لەناو مدرسەكەی خۆشیان ...( قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة)  پێی وایه به هۆی ئەو كەمایەتیەو سەرنەكەوتنیان له ڕێی زۆرایەتی بۆیه ئامرازی توند بەكاردەهێنن[437] .

2-دژایەتی واقیع: ڕای فەرهەنگه یاساییەكان ئەوەیه توندڕۆ ئەوانەن كه كۆمەلگه وگەشه رەت دەكەنەوه .

3- موزایەدە: وەك (قاموس السیاسی) پیی وایه پالنەری (موزایەدە)  له پیناوی خۆ تەئسیل كردنە، نیشانەی هەره زەقی توند ڕەویه ، تا ڕادەی گەیشتن  به (ئەناركی -فوضوی)، بەشیك له ماركسیه توندەكان له ماركس زیاتر دژی بوونی دەولەت ومولكیەت و(تەنانەت دژی سیستەمی دیموكراسیش

---

[436] —سبینوزا-رسالة فی اللاهوت والسیاسة ،ترجمة:د حسن حنفی،دارالطباعة-بیروت،ط1 ص100  وەرگێر لە پەراویزەكە ئەوەی دارشتوە.

[437] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة ص94 .

بوون) لایەنگری توندوتیژیوخوین ڕشتن بوو له پیناو هینانەدی سۆشیالیستی،زۆر دژی ئاین بوو (کتیبی :الله والدوله ) لەلایەن باکۆنینەوه نوسراوه .

له میژووی ئاینیش ئەو دۆخانه بەدی دەکریت ،ئیسلامی توند له پیغمبەر زیاتر موزایەده دەکاو به پیغمبەریان ووت (له خوا بترسه) له قورئانیش به (الا فی فتنة سقطوا) هاتوه، یان (ملکی اکثر من الملك) ، بەشیك دەیان ووته ئیمامی علی ئەتۆ هەرگیز خوای .

کۆمەلیك نیشانەی سایکۆلۆجی توندی وەك(ناهاوسەنگی ،توندرۆ فکری لاوازه دەروونی شپرزەیه ،زۆر بلێ،تەنگەنەفەسی وچیکلدانه بچوکی، پەلەو هەڵەشەیی،خیرا تکفیری وتجریمی ..)،بەشێك وەسفیان به (اتباع الهوی)دەکەن وەك دادگەری ئەو وەسفه دروست نیه بۆیان ، ئەوانه دلسۆزن بەلام له زانیاریا بەهەلەداچووینه .

4- بەشەریەت لەڕووی باری عەقلیەوه له 4 دۆخدان ،هەره باشەکەیان ئەوەیه که عەقلو زانیاریان پیکەوه فراوانه ، سێیەکەی تر :یان عەقلیان له زانیاریەکانیان گەورەتره ئەوانه کەمیك دەمارگیریان دەبیت بۆ بۆچونەکانیان ،یان زانیاریەکانیان گەورەتره له عەقلیان ئەوانه کەمیك توند دەبن له قۆرخکاری دیالۆگ ،یان عەقل وزانیاریان پیکەوه تەسکه ،دەمارگیری وتوندڕۆیی له باری چارەم سەرهەلدەدا .

5-لەگفتوگۆو پرسیارو وەلأم و ئیستنتاقا هەلچون و خێرایی بڕیاری پێوه دیاره کەمترواقعیی و دانایی وزانایی پێوەدیاره، یۆتۆپیانه بیردەکاتەوه وادەزانیێ ئەو زانایه .

6-بیرو هەلس وکەوتی هەلەشەیه ، ناکۆکه لەگەل خۆی ، بەگومانه , مەزندەی خراپه به کۆمەڵگاودام ودەزگای فەرمییەکانی حکومەت ودەزگانێودەولەتییەکان.

7-وادەزانیێ ئەوەی دەگوزەرێ هەموی نەخشەو پیلان و پلانه دژ بەئایین ,دەلێ ئەو دنیایه هەمووی هێزو خراپەیه واهەست دەکات جێگەیو پێگەی ئەو لەوجیهان و ووڵاتەکەی خۆشی نییه بۆیه دەیەوێ هەمووی بگۆڕێ .

8-ڕهەندەنیشتیمانی و نەتەوەییەکانی لا گرنگ نییه و کەمتر زانیاری هەیه ,زیاتر وەك تاکێکی ئومەمی قسەدەکات , زاراوەی ئومەی ئیسلامی و بەرەی کوفرو سەلیبی و یەهودی وزایۆنی

وماسۆنی بەکاردەهنێ ، زیاتر عبارەی عربی لەقسەکانی بەدی دەکرێ حەزی لە نهێنییە ,هەتا ناوی خۆشی دەگۆرێ زیاتر حەزی لێیە بە باوکی(...)ناوبرێت.

9-ئاستی زانیاری وتیگەیشتنی لاوازە چەمك و ترتیبی ئەولەویاتی لی تیکچوە ، ئەو ئوسولە لیکجیایانەی خوارەوەی لی تیکەل بوە : (فکری سیاسی و بەرنامەی سیاسی) ،(ئەوەلیات وسانەویات) ،(نەرم وتوند)، (ئەسل ولق) ،(دیارو نادیار) ، ( هەق وناهەق) ..وای کردوە ستاندەری عەقلی تیکبدا وتیگەیشتنەکانی هەردەم یەکلایەنی وسەتحی وزاهیری بیت . بۆیە بواری چاکسازیان هەیە .

10- جەخت لە بۆچونەکانی(ابن تیمیە,احمدی کوری حنبل,حدیس,زانایانی خلیج و وەهابیەکان دەکاتەوە ,وادەزانن چەقی خەلافەت وپێشرەوی هەرلەناو عەرەب بێت . زیاتر لەوە ( محمدسعید رمظان البوطی) توندی وئەعراب و خەواریجی پیکەوە بەستوە ودەلێ (بیرتەسکی – دژواری – کەمی زانیاری )پێکەوەیان لێکۆبوویتەوە[438].

11- ئەوانە وای لێدەکات لەرووی کۆمەڵایەتی و فکری وسایکۆلۆجی تووشی (عزل)بێت .دژایەتییەکی بێپایانی بۆ رۆژئاواو ئاینی ترو مەزهەبی تر (بەتایبەتی شیعە)هەیە .

12- توندرەو لە مەدرەسەو ئاینەکەی خۆی ئەسیلە ..دەستکردی هیچ لایەك نیە ،چونکە سایکۆلۆجیەکە بەکەس دروست ناکری جگە لە مەدرەسەو ئایدیۆلۆجیاکەی خۆی.

ئەگەرچی ئێمە لێرە باسی نیشانەکانی توندرۆیی دەکەین دەزگای راندی ئەمریکی هەندێ نیشانەی پیچەوانەی داوە لە تویژینەوەیەکی بۆوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی بەناوی (بناء شبكات اسلامية معتدلة-تقرير مؤسسة راندلعام 2007) چوار مەرجی بۆ ئیسلامی میانرەو دیاری کردوە :1- دیموکراسی بوونی 2-دوورە تایفی وتەسکبینی 3-باوەڕبوون بەمافی کەمایەتی و ئافرەت 4- دوورکەوتنەوە ودژایەتی تیرۆر .

<u>هۆکار:</u> ئەوانەی سەروو نیشانەکانیەتی ،هەندێ توێژینەوە هۆکاری توندبوونیش لە نیشانەکانی جیا

---

[438] محمدسعیدرمظان البوطی – المذاهب التوحيدية والفلسفات المعاصرة .ص59 .

دەكاتەوە ،دەكرێ ئێمەش هەندێ خال جیا بكەینەوە ئەگەر چی لەگەلیشی تێك بئالێ ،بەكورتی هۆكارەكان ئەوانەن:

1- كیشەی زانستی: بە زۆری لەوە دێت بەرنامەكە زۆر گەورەو دوورو قووله ،ئەو كەسەی هەلیشی دەگرێ عەقلێكی بچوكیشی هەیە ،جاریش وایە دلسۆزە بۆی تا دلسۆزو ڕۆمانسی تر بێت زیاتر توندڕەوتر دەبێت .

2- كیشەی پەلەیی: بەرنامەیەك دادەرێژرێ لەسەر بنچینەی مدرەسەیەكی فكری ،ئەو كاتە ئەو تاكە یان ئەو لایەنە بەو مەدرەسەیە ئایدیۆلۆجیدار دەبێت وزۆری پێ ڕاستە ،ئەوانەی ناوەستن لە سەر قۆناغبەندی و بەرەبەرەی لە جێ بەجێ كردن ،دەیەوێ یەكسەرئەو ئایدیۆلۆجیە بسەپێنێ و ناشسەپێ تووشی كاردانەوەی توند دەبێ .

3- كیشەی دانایی : ئەو خالەی لە (2) هات و قۆناغ بەندیەكەی لە یەك ودوو و ئاوا سەردەكەوێ بۆ كۆتایی كەچی ئەودانایی ودووربینی نیە دەیەوێ ئەوەی لە سەرەتا پێویستە دەست پێ بكرێ وئەو ناوەستێت هەرە دوایەكەی جێبەجێ دەكا، ئیتر بەرنامەو ڕێبازەكەی پەڕەگر دەردەچێت ..

4- كێشەی نەبوونی (ئەولەویات) زۆربەی ڕێبازو مەدرەسەكان ئەو دەردەیان هەیە ، هەموو بەرنامەیەكی سیاسی خاوەن كۆمەلێك ئامانجی پیرۆزی دوورو ستراتیجیە ،بەزۆری پێی دەلێن (فكری سیاسی), كەواتە فكری سیاسی وبەرنامەی سیاسی لێك جیایە ... ئەو بەرنامەیە بۆ قۆناغێك هاتووە كە قۆناغ بە قۆناغ بەرەو ئەو (فكرە سیاسیە)دەچێت, ئەوەی لەفكری سیاسیدایە مەرج نیە لە بەرنامەوی سیاسیدا بێت جارێ, بۆیە هەندێك كەچاك فكری سیاسیان پێ لە بەرنامەی سیاسی جیاناكرێتەوە یەكسەر ماددەو مەبادیئەكانی فكری سیاسی لە بەرنامەی سیاسی واتە لە قۆناغێكی پێش وەخت پەیڕەو دەكەن ،ڕووبەرووی ئەو گرفتان دەبنەوەو تووشی دەردی پەڕەگری وتوندی دەبنەوە.

**چارەسەری** : توندی و نادادگەری پیكەوەبەستراوە ،بە دیویكی تر میانڕەوی و دادگەریش پێكەوە بەستراون ،ئەوەی یەكەم ڕاستە بەلام مەرج نیە بۆ دوەم ،هەرلەو سۆنگەوە بیریاری گەورە(عبدالوهاب المسیری) دەلێت لە پیناو دادگەری وئاشتی پێویست بەوە دەكات لە چوارچێوەی میانڕەوی هەندێ

تەنازول لەمافەکانت بکەی ..[439]، ئەوە دەبێت لە ژیانی سیاسی بەلام بە پێی تویژینەوەی ئەکادیمی ڕاست دەرناچێت ،دادگەری مانای تەنازول کردن نیە لە ماف ،هەمولایەك بەمافی خۆی دەگا ،تەنازول لە ماف بە خۆشی خۆت پێی دەووتریت (ئیحسان)نەك دادگەری ،خەریکە بلّێین ئەو تەنازولە دەچێتە خانەی پەڕەگریەکی سووك.

لە کۆنەوە پەڕەگری و توندڕۆی بە نەرینی وەسف کراوە ،لە مەیدانی فلسفی بەڕای مەوسوعەی(Stanford Encyclopedia of Philosophy ) ئەفلاتوون پەرەگری فلسفی بەکارهێناوە وەك سەلبی و ووتویوتی دوورە لە ڕێزوئاسودە ، لەو بارەیەوە ئەرستۆ سیاسەتی سازانی وەك چارە بۆ پەڕەگری دیاری کردوە ،نەك هەر بۆسیاسەت بۆ دەولەمەندی وهەژاری بۆ بەرژەوەندی تایبەتی وگشتی ..تا دەگاتە ئاین وسیاسەت ، دیسان لەکۆنەوە سینکا ووتویەتی:(کەس ناتوانی بە توندڕۆیی دریژە بە دەسەلاتی بدا،بەلام دەسەلاتی میان ڕەو دەوام دەکا) [440] ئەوە ئەزمونی بەشەری ، لای پەیامیش واهاتوە (**ان الملك تدوم بالكفر ولاتدوم بالظلم**) ،..دەیەوێ بلی کافری باشترە لە زوڵم وتوندڕۆیی ، لەلایەکی تریش ئەندازەیەك هەیە توندی ئیجابی وتوندی سەلبی لیکجودا دەکاتەوە

زانایان و ئاین کۆکن لەسەر پیویستی چارەسەر بۆ توندڕۆیی بەلام کۆك نین لە چۆنیەتی چارەسەریەکەی ..، هەرمەدرەسەیەك جۆرە چارەسەریەکی هەیە ، هەر لە ڕووبەڕووبوونەوەی توندی بە ناتوندی وەك غاندی و مسیحیەت و ئیخوان و.. تادەگاتە زیندانی و سیدارەدان .

لە نێو مەدرەسەی مارکسی یەکڕا نەبوون سەبارەت بە چارەی توندڕۆیی ،چونکە خودی فلسفەکە لەسەر توندی بنیات نرابوو بۆیە هەر چارەیەکی مام ناوەندی دەبوە هۆی دەرچوون لەمدرەسەکە، لە کاتیکا خودی مارکس بە توندی دژی بوونی دەولەت ومولکیەت وئاین و(تەنانەت دژی سیستەمی دیموکراسیش بوون) ،دژی سەربەرستیش بوو کەچی هەریەکە لە (برنشتاین و کاوتسکی و ..) باوەڕیان بەوە هەبوو دیموکراسی وئازادی بەدیلی توندو تیژیە بۆهینانەدی ئامانجەکان ، زیاتر لەوەش

[439] د عبدالوهاب المسيرى –فى الخطاب والمصطلح الصهيونى ص232

[440] سسبينوزا–رسالة فى اللاهوت والسياسة ص211

کرۆبۆتکین و برۆدۆن وفۆری پییان وابوو(فەراهەم کردنی ئازادی بۆ هەر تاکیکی ئەمریکی ئارامی و دادگەری دروست دەبیت)[441]،مدرسەی مارکسیزمی ڕەسەن هەمــوو(ئاشتی)یەکی لە ژێرکۆمەڵگەیەکی چینایەتی ڕەت کردۆتەوە و بە (بەنج کردنی) لەقەلەم داوە، لە بیری ناشیۆنالیزمەکانیش توندڕۆیی خۆی چارە بوە بۆ زاڵ بوونی میلەتی سەردەستەو (خواپیداوو) و سۆپەرمان و تایبەت و..،سەرەنجام داگیرکاری ونازی وفاشی وتۆرانی وبەعسی وشۆڤینی وفالانژیسی وەك منهج وچارەی کیشەی بەشەریەت بوە بە ڕوانگەی ئەوانە ، لەکۆتایدا ئەو مدرسانە شکستیان هیناو لەژیر سایەی بەهای رۆژئاوایی نوێ ەچەمکی نیشتمانی لە جیاتی نەتەوەیە و هاونەتەوەیی لەجیاتی هاونیشتمانی تا ڕادەیەکی چاك چارەسەری ئەو توند ڕۆییەیە .

لە ڕاستیدا هەریەکەو بارو دۆخی خۆی هەیە ، بۆ سەرجەمیان خالی هاوبەش هەیە ئەویش ئەوەیە سەرچاوەی هەمو توند ڕەویەك ئایدیۆلۆجیای تیدایە ،بۆیە ڕاست کردنەوەی ئەو مەیدانە چارەسەریەکی گشتیە بەلام هەموی نیە . لەلایەکی تریش توندڕۆیی نوێ جیایە لەگەل توندڕۆیی مارکسی و ناشیۆنالیزمی تەنانەت ناکەویتە ژێر تویژینەوەی مەدرەسەکانی سایکۆلۆجیناسی (کریشمر) و (ڤۆند)، (باڤلۆڤ) و (یۆنگ)، (ڤیولا )..، بۆیە لیرە زیاتر تیشك دەخەینە چارەی توندڕۆی نوێ نەك کلاسیکیەکان کە کەمتر باویان ماوە ، لەبەر ئەوەی چارەی فکری و تەقەلای چاکسازی قوولایی ودانایی دەوێ، پیویستی یەکەم ئەوەیە ئەوانەی بەو کارانە هەلدەستن دەبیت جێی متمانەی ئەوانەبن ، کاردانەوەی سایکۆلۆجیان بەرامبەر نەبێت ،وانەزانن ئەوە دەستی دەسەلات و وولاتانی ترە ،کەواتە چارەی توندڕۆیی ئاینی هەر بەخودی ئاین دەکریت نەك بە عەلمانیەت و ئیجرائەتی تری نامرۆڤانە .

لەچوارچیوەی ئاینیش لەهەموو چارەسەریەکان خراپتر ئەوەیە کە پشت دەبەستن بەو هۆکارەی گوایە قوول بوونەوە لە ئاین توندڕۆیی وەبەرهەم دێنێ ،گوایە فەرموده هەیە (..**وإياكم والتنطع والتعمق والبدع، وعليكم بالعتيق– عن عبد الله بن مسعود.**) ، بە پیچەوانەوە قوول نەبوونەوەو تینەگەیشتن لە ئەسلی ئاین هۆکارو زەمینەی توندڕۆیی ، (تعمق) مانای راسخە ..چۆن دەبی لە قورئان دەلی

---

[441] القاموس السياسي –احمدعطية الله ط3 ص177 ، ص890

(والراسخون فی العلم..)ئیمانداره .لێرەش بە خراپە باسی بکا ، ئیمام علی لەو بارەیەوە پێی وایە نەزانی و سەرچیخی هۆکاری توندیە نەك قوولی و ( واتە هەردەم جاهیل توندە ،توندیش جەهلە) ، ،کەواتە تعمق توندڕەوی دروست ناکا بە پیچەوانە تعمق نەبوون ئەو دەردەی هەیە ،تعمق نەبوون بەشیکە لە راگرتنی عقلی موسلمان، فەرمودە ڕاستەقینەکە ئەوەیە : (**وإياكم والغلو في الدين ، فإنما أهلك من قبلكم الغلو في الدين)** ،موزایەدەی ئاینی توندڕۆیی دروست دەکا .

مەرج نیە هەمو جارێ ولەهەمو دۆخیکدا توندو تیژی خراپ بیت ، لەکات وشوینی خۆی پیویستە هەمو ئاینەکانی ئاسمان ویاساکانی سەرزەوی پەیرەوی ئەو ڕاستیە دەکەن ،هەریەکە لە بنەمای (اللاعنف) ی غاندی و ئەو بنەمایەی ئاشتی مەسیحی (ئەگەر شەقێکیان لەولا ڕوومەتە دا لا ڕوومەتەکەی ترت بۆ وەڕگێڕە) و بنەمایەکانی ئیخوان کە دەلیت(ئیوە وەك درەخت بن کە گاشەبەردیان لیدان مێوەیان بۆ بەردەنەوە) هەموی مرۆڤایەتیە بەلام ئەوانە چارەسەر نین ، چارەی توندڕۆی ناکا ، توندڕۆ جار وایە کە ڕوومەتت بۆ وەرگیڕاو بەرگریت نەکرد ئەوا ئەوجارە بە بلۆك لەسەرت دەدا نەك لەلا ڕوومەتت ، سەرلەنوی (پاپا شنۆدەی سییەم) پیی وایە چارەی توندڕۆیی خۆڕاگری وبەرگە گرتنە تویژینەوەیەکی بەناوی (اللأستقامة ضدالتطرف)هەیە لە کتیبی (معالم الطريق الروحي ) کە بەرجەستەیەکی تری بنەمای (لاڕوومەتەکەیە) ، ئەو ڕایە بۆ چارەسەری توندی خۆی لە خۆیدا پەڕەگریەو هاندانی توندیە و کوشتنی رووحی بەرگریە کە یاساکانی زەوی وئاسمان ڕێیان پیداوە .

**<u>میکاینزمەکانی</u> :**

لە عەولەمەو( مەداری جیۆسی ) وای کردووە سنورو ئیجرائەتی عەسکەری و ئەمنی کافی نەبێت بۆ بەرەنگاری ، بەپێی بنەمایەکی سەربازی دەڵێت ڕشتنی ئارەقەی ڕاهێنان قەبارەی ڕشتنی خوێن کەم دەکاتەوە ,بەهەمان شێوە خۆپاراستن وچارەسەر و ووشککردنی سەرچاوەکانی توندڕۆیی لە ڕووی ئایینی وسیاسی وسۆسۆلیۆجی وئایدۆلۆجی وسایکۆلۆجی،دەبێتە هۆی کەمکردنەوەیەکی زۆری زیانەکانی ، ، هەنگاوەکان :

1- یەکێ لەهەنگاوە هەرە بنچینەییەکان ئەوەیە پانتایی دیاری کردنی فکری کۆمەلایەتی وسیاسی زۆرتەسك بکەیتەوە بۆکارکردن لە سەری , زۆربەی سروشتی توندڕۆیی لایەنگرانی لە کۆمەڵێك خەسڵەتی هاوبەش دێت .

2- سەرچاوەی یەکەمی فکری ئەوانە هەندی ماموستای ئاینی و مزگەوتە ، بویە دەبی خولیکی چروپری دیراسەکراو بۆ تەواوی مامۆستایانی ئاینی بکریتەوە یتایدایە به منهجیکی ڕەسەن چاکسازی لەفقهو و فتواو فکری توندڕۆیی بکریت، تیایدا سەنتەری وەرگرتنی قتواوەرچەرخینیە سەر دەق نەك فکری یەك کەس .

3- لیك جیاکردنەوەی کەلتور و عەقلی عربی (پڕ ئەزمە) و عەقلی ئاینی ساغ .

4- کوتای هینان بەو بیرە سەقەتەی کە (گوایە ) مرکزی تیگەیشتنی ئاینی دەبی لەنێو عرەب بیت، عرب فەزلی هەیە بەسەر میللەتانی ترو ناکۆکی لەگەل عرب ناکۆکیە لەگەل ئاین ،ئەوچەمکانە لە فقهی سەلەفی وئیبن تەیەمیە وتەیاری عروبی دێت ،لە سەردەمی ئەمەوی تائێستا زال بوە بەسەربەشیکی زۆری مامۆستای ئاینی .

5- ڕاست کردنەوەی نەزەریەی موئامەرە .

5-چاکردنی باری ئابوری ونەهیشتنی گەندەلی و جیاوازی چینایەتی وبێسەروبەری وبرەودان بە ئازادی ودیموکراسی وسەروەری یاساو ڕەخساندنی دەرفەتی سیاسی ودەرفەتی کار بە یەکسانی .

7- دەستکاریەکی جەوهەری منهجی تەعلیم بەهەمو بەشەکانی زانستی وئاینی وهزری بەئاراستەی نشتمان بەروەری و تەبایی و هاریکاری بە پالپشت بە ئەسلی ئاینی .

بە ڕوونی لە بیری توندڕۆیی تیکەلی هەیە لە کۆمەلیك چەمکی لیك جیا ی وەك: (فکری سیاسی و بەرنامەی سیاسی ) ، (دیموکراسی ولیبرال دیموکراسی) ،(جهادو قتال) ، (پەرلەمان وتشریع) ، تینەگەیشتن لە سیستەمی جهانی کە لەسەر پراگماتیکی بنیاتنراوە نەك کوفرو ئیمان (مسیحی وموسولمان)

هەمو ئەوانە و لە نیشانەکانی سەرووش دیاری کرا ،پیویست بە خول و پێدانی زانیاری دەکات ،زانیاریەك بەو مەرجەی هەم لەو ئاستە بێت هەم بشێت بۆ وەرگیران لەلایەن خەلکی توند ڕۆیی.

(13)

**ڕابوونی ئیسلامی** الصحوة الإسلامية Islamic Awakening

**ئەوانەش دەگریتەوە ( ئیسلامی سیاسی,سیکولار،ڕادیکالی ، ئیسلامفۆبیا، بیداری ، رابوونی مەزن–الصحوه الکبری ، اسلام حرکی –ئاینی بزێو ،..**

ڕابوون لە کوردیدا بە مانای هەلسانەوەو ووریابوونەوە، پیناسیکی روونە لەزمانی کوردی هەمو ماناکانی گوزارشە لەبە خەبەرهاتنەوە لە نوستنیك ..یان ووردتر ڕابوونێکە لە نێوان نوستن وبەخەبەر هاتنەوە ،مانای وایە هەمو قۆناغەکانی رەوتی ئیسلامی ناگریتەوە بەلکو سەرەتاکەی دەگرێتەوە ، لە عربی بە مانای رۆژهەلاتن وکۆتایی تاریکی وغافل بوون دیت (وەك لە لسان العرب )هاتوە ، **ڕا**بوون لە زۆربەی ئاینیەکانی تریش وەك ئیسلام بە مانای ووریابوونەوەو هاتنەوە سەر عەقل بۆ تێگەیشتنی نویٚ لە ئیسلام ، لە ئاینی مسیحی ویەهودی و لەمەزموری داودیش پیچەوانەی ڕابوون بە نووستوو غەفلەت وبێئیرادە وەسف کردوە، پەیامی الرسول: (استيقظ أيها النائم، وقم من الأموات، فيضئ لك المسيح). (اف14:5) لە مەزموری داود:(أنا أستيقظ مبكرًا) (مز :57) ،لە ڕاڤەی زاراوەی(يقظة)دەلیٚ ڕابوون مانای ئەوەیە مرۆڤیك دوور لە ڕێنمایی خودا دەژی لە ناکاو بەخەبەر دێتەوە لەو هەلەیەو بە خۆ دیتەوەو ،ئەو پاچە هۆنراوەشی بۆ ریکخستوە :

| | |
|---|---|
| **قام المسيح الحی هل** | **مثل المسيح تراك قمت** |
| **أم لا تزال موسدًا** | **في القبر ترقد حيث أنت** |

لە نیو مەسیحیەکانی کۆلۆنیالی ئەمریکا لە سەرەتای سەدەی 18 سەری هەلدا وەك بیداربوونەوەی (نەسرانی) لەو وولاتانە، سەرکردەی گەورەی وەك(جۆناسان ئیدواردز ) و(جۆرج وایتڤیلد) لیٚهەلکەوت ، ئەو جم وجۆلانە ناوی نرا (ڕابوونی مەزن-الصحوه الکبری) ،رابوون لە مانای ئاینی راستەقینەی (ئاین –ریلیژن) ری مانای دووبارە –لیژن بەمانای کۆکردنەوە ،هەموی بە مانای گەڕانەوە بۆ عەقل و بیرو تیفکرین ، لە لاتینیەکەی ریلیژن بە مانای دووبارە بەستنەوە بە خودا ، کۆمەلیك ناوی تری

( ڕابوون) هەیە وەك رابوونی ئەوروپی ڕابوونی شیوعیەت ڕابوونی نەتەوەیی رابوونی شارستانی ناوزەدکراون ،ڕابوونی عربیش هەیە کە لە کتیبی (يقظة الامه العربية- نجيب عازوري) لەسالی 1905 دەرچوە ، هەموی لەجەوهەردا هەمان مەبەستی ووریابوونەوەو بیداریە لەو بوارە ،بە واتایەکی تر لە جیاتی بەدواکەوتنیکی دوورودریژی بیئاگاییی بۆ شارستانی رۆژئاواو رۆژهەلات هەولی بینای شارستانی ودادگەری ئیسلامی دەدریتەوە بە پێی سەردەمی ئیستا، لەو سەردەمە کە ئەو ووشەیە دەخرێتە پیش ئیسلام بەمانای بوهاری ئیسلامی و بەخەبەرهاتنەوە و ووریابوونەوەیەکی ئیسلامی ،لەدوای بیئاگابوونیکی زۆرەوە ، لەدوای تەسلیم بوون بەوەی ئاین بۆ خوداو نیشتمان بۆمرۆڤ ،رازی نەبوون بە لێکجیاکردنەوەی ئاین لە ژیان وسیاسەت کە جیهانی نوێی لەسەر دروست بوە، داوای پێادەکردنی دادگەری ئیسلامی دەکا لە هەموو بوارەکانی ژیان لە جیاتی یاسا دەستکردەکان ، ئیسلامەکی نویَ نیە بەلکو نوێبونەوەی فکری بەشەریە بۆ تیگەیشتن لە ئیسلام ، هەروەك شوعی ئەوانەن کە دەیانەویَ شیوعیەت تگبیق بکەن, شۆشیالیستی ئەوانەن دەیانەوی سۆشیالیستی پیادە بکا لیبرالێش ئاوا ,ئیسلامی ئەوەیە کەدەیەویَ شریعەتی ئاین پیادەبکا لە جیاتی ئەوانە ، واتە لەهەمان کات نویبوونەوەشە .

<u>زاراوەی( ئیسلامی سیاسی) دژ بە(ڕابوونی ئیسلامی)</u>: لەدوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی لە ئیرانی 1979 چەمکی ڕابوونی ئیسلامی زۆر بە خێرایی تەنیەوە ، لەبەرامبەریشدا زاراوەی تری توومەت بۆ رابوون سەری هەلدا ، لەسەرەتا بەناوی (میسالی) ئینجا (خومەینیە-اصولیە-ئیسلامی —ئیسلامەوی-ئیسلامی چەپی ئیسلارکسی —ئیسلائەمریکی —..) لەهەموان بەکار تر زاراوەی (ئیسلامی سیاسی)ە ،کە زاراوەی ئەوانەی زۆر ناحەزی رابوون ،بۆ جیاکردنەوەیان لە موسولمانی ئاسایی (یان کلاسیکی)، ئەوەش مانای سیاسیو کۆمەلایەتی وهەتا یاسایشی تێدایە ،بۆ ئامادەباشی قەدەغەکردنی .

بە پێی هەندیَ سەرچاوە زاراوەی ئیسلامی یەکەم جار لە کتیبی (ابوالحسن الاشعری- مقالات الاسلامین 936م) بەکارهاتوە، ابو قاسم البلخی هەمان عنوانی لەو سەردەمی نوسیە کەواتە

کۆنە لەگەل ڕابوونی ئیسلامی پەیدا نەبوە ،بەلکو لەگەلی زیندوو بوویتەوە[442] ، هەروەها دەشگۆترێ یەکەم جار شیخ محمدرشیدرەزا زاراوەی(ئیسلامی سیاسی) بەکارهێناوە وەك هاوتای حکومەتی ئیسلامی ،لە هەندێ سەرچاوەیەکی تری دەگمەن دەلێن یەکەمجار هیتلەر بەکاری هێناوە بۆ چالاکیە سیاسیەکانی هەندێ بزوتنەوەی ئیسلامی[443] ، هەرچی( د علی اکبر ولایتی) دەلێ زاراوەی ئیسلامی سیاسی زیاتر لەگەل کتیبی (ئیمام خومەینی– کشف الاسرار- 1964) زیاتر سەری هەلدا[444] هەندیکی تر دەلین یەکەم جار لە کتیبی(الفکر الاسلامی الحدیث فی مواجهة الافکارالغربیة)باس لە(صحوە الاسلامیە)کراوە..، بەلام ئەوی ڕوونە زیاتر لە کتێبەکەی (گراهام فوولەر)بەناوی (السیاسة الامریکیة تجاه الاسلام السیاسي) بوە زاراوەیەکی نیودەولەتی و زاراوەی ئیسلامی سیاسی زیندوو کردەوە ،لەدوای ئەو ڕووداوانەی بەدوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیرانی لە 1979 هینایەدی ،بوە هۆی پەرەسەندنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و سەرکەوتنیان لە ئێران و ئەفغانستان و سودان و چیچان تا جیکستان وجزائیر و تورکیا و ئوردن و لبنان و تونس و پاکستان و مالیزیا و ئەندۆنوسیا و چەندین وولاتی کۆمارەکانی ئیسلام نیشینی سۆڤیەتی و پێشوو، بە هەردوو ڕێگەی شرعیەتی شۆرشگێری و هەلبژاردنی و ژیانی دیموکراسی سەرکەوتن و زۆرایەتی دەنگی خەلکیان هێنا، لە ئەزموونە کوورتەکەشیان لە ئیدارە وڕێکخستن و پەرەپێدان و ژیانی نوێ ی خەلك سەرکەوتن ، لە جزائیر لە 75٪ی دەنگیان هێنا لە هەلبژاردنی شارەوانی 1991 لە سەرجەم1500 شارەوانی(1300) شارەوانیان هێنا, کە خەلکی بینیان ئیدارەو کاروبارو دادگەری و کێشەکانی ئابووری سەرکەوتوترن لە شارەوانیەکانی حزبە عەلمانیەکانی تر ... ئەوا لە هەلبژاردنی 1991 پەرلەمان دەنگیان زیادی کرد بۆلە 86٪ ، بە هەمان شێوە لەبەر هەمان هۆی سەرەکی لە تورکیا لە 23٪گەیشنە 32٪ لە (تەکمیلەکەی)وئیستاش زۆر زیاتر, بەو شێوەیە ئەو ڕابوونە بەو شێوەیە بە ئازادی گەشەی بکدایە بەیەکجاری حزبە علمانیەکان دەتوانەوە لە جیهانی ئیسلامی، بە ڕوانگەی ڕۆژئاواش ئەوە

---

[442] د محمد عمارة –حوار الاسلامیة والعلمانیة ص5 .

[443] معجم مصطلحات الفکر الاسلامی المعاصر ص188 هەروەها د محمد عمارة –الاسلام السیاسي والتعددیة السیاسیة ص5 هەروەها : الموسوعة الحدیثة للمصطلحات السیاسیة والاقتصادیة ص59 .

[444] د علی اکبر ولایتی – موسوعة الاسلام وایران ج3 ص279 .

مەترسیدار دەبوو ... بۆیە هەم لە دیموکراس و ئازادیەکە پەشیمان بوونەوە، هەم دیراسەتیان دەست پێ کرد بەهاوبەشی لەگەڵ هیزە عەلمانیەکانی ناوچەکە بۆ چەواشەیی ..هەمو ئەوانە پێویستی بە زاراوەو چەمکی نوێ هەیە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو واقیعە ،لەوەوە زاراوەی ڕابوونی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی و (اسلامویە) و (ئوسولی)[445] و(ئیسلامفۆبیا) و.. سەری هەلدا ، ،هەندیکیش وەك توومەت داتاشراون  بۆ جیاکردنەوەیان لە ئیسلامیکی پان وبەرینی دانپیهینراو ، وەك (میسالی, خمینی, ئوسوڵی, ئیسلاموی, ئیسلامی سیاسی, تیرۆرستی, ...), هەرچەندە ئەو زاراوانە هەریەکە ئەسڵێکی تری هەیە ڕاستەوخۆ زادەوپەیوەندی بە ڕابوونی ئیسلامی نیە،  لە کاتێکدا (میسالی)بە مەزهەبێکی فلسەفی ووتراوە, کە مەبادیئەکانیان ناشێت بۆ پەیرەوکردن, ئوسولیش یەکەم جار بە (فۆندەمینتالەکانی کاسۆلیك)ووتراوە, تادەگاتە اصولی فیندەمینتالیزم کە لەئەسلدا (وەك قاموسی ویپستەر) بەجۆلانەوەی پرۆستنانی ووتراوە کە ویستیانەکتابی پیرۆز وەك خۆی پیادە بکریت .

زاراوەکانی سەروو ماوەی کەم بوو زاراوەی تر هاتە پیش ، لەسەرەتادا (ئیسلامی ئوسولی)بەکارهات لە 1994 لەکۆنگرەیەك لە واشنتۆن  بە ناوی (مەترسیەکانی ئیسلامی ئوسولی) ،زیاتر باس لە کاریگەری شۆرشی ئێرانی بەسەر سەرووی ئەفریقاو(بەتایبەتی جزائر و سودان) ،لەدوای ئەوەی لایەنی عەلمانی و عسکری جزائیر سەرەنجامی هەلبژاردنەکانی جزائیریان هەلوەشاندەوە وتوندوتیژی سەری هەلدا زاراوەی (ئیسلامی توندڕۆ)سەری هەلدا ، تێکڕای ئەو ژیانە سیاسیەشیان لە ڕوە ئەکادیمیەکە ناونا (ئیسلامی سیاسی) .

**پێناسەکانی (ئیسلامی سیاسی) و(ڕابوونی ئیسلامی) :**

ڕابوونی ئیسلامی ماناو پێناسەکەی  کیشەی لەسەر نیە مەگەر لە رۆمانسی پێناسی ، کەچی زاراوەی (ئیسلامی سیاسی)داهێنرایە دژ بە مەدرەسەیەك لەلایەن مەدرەسەی تر، لە چوارچێوەی

---

[445] یەکەم جار زاراوەی (رادیکال) لەلایەن (جیمس نۆکس لە کۆتایی سەدەی 19 بەکارهات ، بەلام مەرج نیە بۆ ئەو مەبەستەی بەکارهینابیت .

زاراوەیەکی تر کە بە (ئیسلامفۆپیا) ناوزەد دەکرێت ، ئەوەش لە زاراوەیەکی فراوان تری رۆژئاوای هاتوە پێی دەڵێن(xenophobia-ترسان لە بێگانە)هاتوە ،یان وەك ئۆکسفۆرد بە (رِق لە بێگانە) گوزارشی کردوە،لەدوو وشە پیکهاتوە(xeno )واتە بێگانە،(phobia ) ترسان[446]، بەگشتیەکەی ئیستا ئیسلامفۆپیا بەمانای(درِو نامۆو هەرِەشەودوگمایی وتوند ودابرِاو و دواکەوتە)دەدا، توندرِەوی و تیرۆر بەرپا دەکات ،دەگۆترێ یەکەم جار(هنری لامینتس)ی بەلجیکی بەکاری هێنا،

زۆر لەمێژە دروستکردنی (دوژمنی دەرەکی) بۆ شەرعیەت دان بە ئیمپریالیزمی جیهانی وەك ستراتیژیەتێك جێگەی حۆی لە فەرهەنگی سیاسی و سەربازی رۆژئاوادا کردووەتەوە، تا جەنگی سارد لە ئارادابوو دوژمنە گەورەکەیان کۆمۆیۆنیزم (شیوعیەت) بوو، دوای ئوسوڵی ئیسلامی ( islamic fundamentalism) پاساوێکی لەبارە بۆ دروستکردنی دوژمنێکی تر کە ئەویش ئیسلامە بۆ شەرعیەت پێدان بە ئیمپریالیزمی نوێی جیهان و جەنگی داهاتووی شارستانیەتی رۆژئاوا لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامیدا!! بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە جیهانی ئیسلامی دەستیان نەبێت لە نەخشاندنی ئەم رِۆژەی کە تێی کەوتوون، لە دواکەوتوویی و پاشکۆیی و دوورکەوتنەوە لە دینەکەیان و چەوساندنەوەی گەلانی موسڵمان لەلایەن رژێمە قەومی و بەناو ئیسلامیەکان کە هەر هەمووی زەمینە خۆشکەربوون بۆ دەست تێوەردانی دەرەکی و پاشان دروستبوونی بزاڤە ئیسلامیە رِادیکاڵیەکان، بۆیە ئەمرِۆ تەشەنە پێدانی دیاردەی ئیسلامۆفۆبیا (ترس لە ئیسلام) لە رِۆژئاوا پێدەچێت نەخشە بۆکێشراو بێت بۆ وەدەست هێنانی رِای گشتی بۆ پشتیوانی ماددی و مەعنەوی لە جەنگی دژە تیرۆردا.

رِاستە ترس وەك هەر غەریزەیەکی دیکەی پێکهاتەی مرۆڤ بوونی هەیە، بەڵام هەرکات ئەو ترسە بێ‌پاساو بوو، ئەوە لە فەرهەنگی رِۆژئاوادا بە فۆبیا phobiaلەقەڵەم دەدرێت.

کێشەی ئەو زاراوەیە وەك ئەوانی ترنیە ،زۆر زیاترە لایەنی ئاینی هەر دان بەزاراوەی (ئیسلامی سیاسی) نانێن تا پێناسی بکەن ،بۆیە زۆربەی پیناسەکان هی ناحەزانی رِابوونی ئیسلامە ، ئینجا

---

[446] الموسوعه السياسيه : إعداد : احمد سعيد تاج الدين الماده: خوف من الاجانب

لەناو ئەوانیش لە بارودۆخی واشدا هەاسەنگاندن وبۆچوون و پیناسی جیاجیای دەبیت ، هەندیکی لێهەلدەبژێرین :

+ **قاموس حزب البعث** : رادیکالیایەتی وتوندڕۆیی پێکەوە بەستوە[447].

+ كتاب اليقظة الروحية لقداسة البابا شنودة الثالث-اليقظة: الإنسان الذي يعيش في الخطية، بعيدًا عن الله، يشبه الكتاب المقدس بإنسان نائم، لا يدرى بنفسه ولا بحالته، كيف هو! فهو محتاج أن يستيقظ. لذلك يقول الرسول (إنها الآن ساعة لنستيقظ من النوم..) (رو11:13).

+ لە (معجم المناهی )بە خراپی باسی (رابوونی ئیسلامی-صحوە الاسلامیە) کردوە بەوشێوە وەك خۆی:

(صحوة الاسلامية: هذا وصف لم يعلق الله عليه حكماً ، فهو اصطلاح حادث ، ولا نعرفه في لسان السلف جارياً ، وجرى استعماله في فواتح القرن الخامس عشر الهجري في أعقاب عودة الكفار كالنصارى إلى (( الكنيسة )) . ثم تدرج إلى المسلمين ، ولا يسوغ للمسلمين استجرار لباس أجنبي عنهم في الدين ، ولا إيجاد شعار لم يأذن الله به ولا رسوله " إذ الألقاب الشرعية توقيفية : الإسلام ، الإيمان ، والإحسان ، التقوى ، فالمنتسب : مسلم ، مؤمن ، محسن ، تقي .... فليت شعري ما هي النسبة إلى هذا المستحدث (( الصحوة الإسلامية )) : صاحٍ ، أم ماذا ؟؟ ثم إنه يعني أن الإسلام كان في غفوة ، وحال عزل في المسجد — كالديانة النصرانية كانت في الكنيسة فحسب — ثم أخذ في التمدد والانتشار ، ففي هذا بخصوص الإسلام إغفال للواقع ، ومغالطة للحقيقة ، وإيجاد جو كبير للتخوف من المتدينين والرعب منهم حتى تتم مقاومتهم ، وفي مصطلحات الصوفية كما في رسالة ابن عربي (( مصطلحات الصوفية )) : الصحوة : رجوع إلى الإحسان بعد الغيبة بوارد قوي)[448] .

ماوە دیاری بکەین کە زاراوەی بەرامبەر ئاینی بریتیە لە مولحدی ، atheismبە مانای (لا الهیە) هەرچی agnostism بەمانای گومڕایی (نازانم-اللادریە) واتە بۆی ساغ نەبوویتەوە ئاخۆ خوا هەیە یان نیە ،هەروەها زاراوەی (گومان-ریبە) زاراوەی سروشتانی و دەهری و..هەرچی دیزم وتاڕادەیەك ( theism) ڕێك پیچەوانەی atheism پیزم مانای باوەڕ بەخوا (الە شخصی) ، Poly theism واتە

---

[447] تعریفات ببعض المصطلحات —مكتب الثقافة والاعلام ص66

[448] معجم المناهی اللفظیة ص336.

فره خوایی ،ئیتر هینۆ پیزم مانای کۆمەلە خوایەك ویەکیان بۆخۆی هەلبژاردوە ،پانپیزم حلولیە (هەموی لە خوا بەرجەستەبوە ) ،پانەنپیزم مۆنۆ پیزم ئەو خوایە کە ئەهلی ئاین دەیناسن[449]

**سەربردەی ڕابوونی ئیسلامی** : هەولیکی زۆر هەیە دابەزین و پاشکەوتنی جیهانی ئیسلامی بگێڕنەوە بۆ سەردەمی عوسمانی ، گوایە چونکە عرب نەبووینە ونەیانتوانیوە باش لە قورئان وسونە بگەن ولەوکاتیەوە دەردەکان دەست پیدەکات ،داود ئۆغلۆ بە گلەییەکی زۆرەوە رەدی ئەوانە دەداتەوە لە کتیبەکەی (العمق الستراتیجی) ، ڕاستیەکەی وانیە دەتوانین بلێین دەردەکان لە کۆتایی میژووی عوسمانی زەقتر بەرجەستەبوە،بە ئاڕستەیەکی تریش بەشیکی تر لە زانایانی عربی وەك(د محمد عمارە – د یوسف قرزاوی- عمر عبید حسنە- د عمادالدین خلیل..) لە هەولدان بۆ ئەوەی ڕابوونی ئیسلامی نویش بدەنە پالّ عەرەب، دەلێن یەکەم بانگەوازی (شیخ حسن عەتار1711-1835ز) سەرەتای ئەو ڕابوونەیە کە بوە هۆی بەرەنگاربوونەوەکانی محمدعلی پاشای میسر دژ بە ئیستعمارو سەرهەلدانی زانایانی جامیعەی ئیسلامی لە کۆتایی سەدەی 19ی وەك (جمال الدین افغانی – محمدعبدە-محمدرشیدرەزا) ودوایش دروست بوونی هەندێ کۆمەلەی وەك (عروة الوثقی- ام القری- وتاگەیشتە دروست کردنی ریکخستەنە ئیسلامیەکانی سیاسی لەسەدەی 20 ، هەرچی( د علی اکبر ولایتی) تەمەنی رابوونی ئیسلامی زۆربە میژوودا قول کردۆتە بۆ شکستەکانی عوسمانی و پەیماننامەی کارلۆ ڤیجەی1699 یان بۆ شکستی ئیران بەرامبەر روسیا،ناپلیۆن ومیسر سەرکەوتنی بریتانیا بەسەر موسولمانانی هند[450].

لە ڕاستیدا ئەوانە ڕۆلی گرنگیان بینیە بەلام خاوەنی ڕابوون نین بەلکو بەشیکن لە نویبوونەوە ، بەلگەی وانیە ئەو کۆمەلانە بناغەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی ئیستا بن ، بە پیچەوانەوە هەر دەستەو تاقم وجولانەوەیەکی سەردەمی عوسمانی (ئەوانەی سەروو و ئیتحادو تەرەقی و بزوتنەوەی وەهابی ) تا سالی 1908 بە دەرچوون لە (ئیجماع) هەژمار دەکریت مادام خەلافەتیك هەبوە، با ئەو خەلافەتەش سەلبیاتی هەبووبێ ،بەشیکی تر زیاتر دەلین ئەو جۆرە دەستەو تاقمانە بە پیلانی بیانی

---

[449] جون هيك – فلسفة الدين ت:طارق عيسى ص9–10

[450] د علی اکبر ولایتی وسوعە الاسلام وایران ج3ص206

دروست بووینه ، بۆیه ئەوجۆره جم وجۆله پەیوەندیەکی وای به ڕابوونی ئیسلامی سەردەم نیه ،بەلکو ڕیشەی ئەو ڕابونه له دوای ئینقلابی ئیتحادوتەرەقی سالی 1908 دەست پیدەکات .

لەدوای داڕووخانی خەلافەتی عوسمانی له 1924 سەرتاسەری موسولمانان تووشی دۆخێکی سستی وبه جێمان بوون تاڕادەی بۆرژان،له کاروانی گەشەش به جێمان ،پانتایی کاریگەری ئاین قەتیس ماوه له پەیوەندیەکی ووشکی ستونی نێوان تاك و خودا، ئاین سست ترین فاکتەربوو لەسەر ئاستی نێودەولەتی وئیقلیمی وهەتا ناوەکیش،زیاترین قەبارەی (جیهانی سێیەم )دەکەوێته جیهانی ئیسلامی ، لەکۆتایی سەدەی 20 جم وجۆلێکی بێداری وبەخەبەرهاتنەوه له ئاینی ئیسلام ڕوویدا بوه هۆی پەیدا بوونی نوسەر وشاعیرو هونەرمەندو مونەزیرو موفەکیری ئیسلامی ،لەو زەمینەیەش به دەیان بزوتنەوەی ئیسلامی سەری هەلداو گەشەی کرد ..ئەو جم وجۆلو گەشەیه پێی دەووترێ (ڕابوون ) .

<u>**باری جیهانی ئیسلامی پیش ڕابوون:**</u> هۆکاری دواکەوتن زۆره (وەك ئەوه نیه لەسەروو هەندی زاناو عاقلمەندی عرب باسیان کردوه )، زۆر گورزی بەشەری بەر ئاین کەوتوه ،بەلام له ڕەوتی ئەوباسه گەورەترین گورز ئەوەبوو :(پێوەری ئیسلام به پێی مەرکەزیەتی ڕەگەزی عرب داڕژرا ،خاکی عەرەبیش کرا ناوەندی جوگرافی ئاین ،سەردەمی پیغمبەریش کرا هۆکاری هاتنه خوارەوەی پەیام )، ئیتر ئاین بچوك بوویەوه له ڕەگەزێك ونیشتمانێك وبڕگەیەکی زەمەنی ،هەلبەته سروشتی ئاینی ئیسلام لەگەل هەرسێکان ناکۆکه ،ئەوەی زۆر کاریگەری مایەوه ئەوەبوو لەپیشەوەی هەمویان عەقلی عربی بوه مەلبەندی بیرکردنەوەی ئیسلامی که مەرجەعەکەی (نەفامی)پێش ئیسلامه ، ئەوەش به زەقی دەرکەوتەوه ڕاستەوخۆ لەدوای خەلافەتی راشد دەست ، له رەسەنایەتی ئاین لادرا ،کار گەیشته ئەو رادەیەی گەندەلی خودی خەلیفه لەسنور دەرچوو ، ئەو عەقلیەته زیاتر له دەسەلات ڕەنگی دابۆوه نەك له مەیدانی زانستی که زیاتر عەجەم بوون ، بۆیه زۆر بەدرەنگەوه ئەو نەفامیه گەیشته گۆڕەپانی زانستیش ، شان بەشانی دەسەلات بەشیکی بەکاری فقهیش بەردەوام پاساوی بوون و دواکەوتنەکانیانی بۆ پینه دەکرد ، دواکەوتنەکان کاریگەر بوو کاتێ هەندێ ڕووبەڕووبوونەوه له نیوان عاقلمەندان و وەعازەکانی سەلاتین ڕوویدا ،سەرەنجام :

11. له ململانییی عەقل وفیقهدا ئەوەی دوای سەرکەوت .

12. زانستی وفلسفی تەکفیر کرا.

13. لەکاتیکا له ناو مسیحی کۆمەلەی کویکرز بەسەدان زانای گەورەی وەك نیوتن و تیابوو بۆ گەشەی زانستی ،له ناو یەهودیش له تلمۆد تلمودمانای عیبری (فیرکردن ) پیکهاتوه له 63 سەرچاوەی سەرەکی ،تیایداچارەی زانستەکانی شریعەو میتافیزیك وفلسفەو میژوو وئەدەب و فیزیاوکیمیاوتا وگەردوون دەگاته کشت وکال و تکنۆلۆجیا ..له فقهی ئیسلامی ئەوەیان(نوقستانه).

ئەو ڕەهەنده له ناوەڕاستی سەدەی 19 زیاتر کاریگەر دەبیت لەژیر رۆشنایی گەشەی جیهان وبه جێمانی جیهانی ئیسلامی ، تا لەجەنگی جیهانی یەکەم کەوتنه ژیر دەستی دونیاو دابەش کران ،ئەوەی ماشبوو کمال ئەتاتۆرك هەنگاوی تری دژ به دواکەوتنی ئاینی بەو شیوانەدرا :

+ له 1/ 1920/7 یاسای باری کەسیتی و سنورەکانی شەریعەتی هەڵوەشاندەوە و یاسای تاوانی هینا جیٚ ی.

+ له 3/16/ 1921 لەناوچەی (قرم) خۆش بوو لەقازانجی ڕووسیا، له 1921/10/20 له ناوچەی (کلیکیا) خۆش بوو لەقازانجی فرنسی و... هتد

+ له 1/ 11/ 1922 سەلتەنەتی هەڵوەشاندوەوە و (سوڵتان محمد واحد الدین) یشی لادا.

+ له 29 /10 / 1923 خیلافەتی وەچەرخانده کۆماری و خۆشی بووە سەرۆك کۆمار.

+ له 3/ 3 /1924 خیلافەتی بەیەکجاری هەڵوەشاندەوە.

+ له 28/ 4 /1924 داد گای شەرعی هەڵوەشاندەوە.

+ له 10/4 /1924 بریار درا یاسای مەدەنی سویسری پەیرەو بکریٚ.

+ له 10/ 4/ 1928 مادەی(ئاینی ڕەسمی دەوڵەت ئیسلامە) لەدەستور هەڵوەشاندەوە.

+ له 1/ 1928/11 هەمو پیتە ئیسلامیەکانی گۆری بەپیتی لاتینی...لەگەڵ زۆر هەنگاوی تر تا لەسالی1931 بەبیانوی ئەوەی تورکیا دەوڵەتی ئیسلام نیە ئامادە نەبو بچێتە کۆنگرەیەکی سەرانی ئیسلامی لە قودس ورۆژی یەکشەمەشی کردە پشوو .

جیهانی ئیسلامی کەوتە مەیین وبەجێمان و پاشکۆیی، لە پیشڕەوی داکەلا و کەوتە دوای ڕووداوەکانی جیهان وەك شوینکەوتەو لاساییکەرەوەیەکی سەلبی ، لە هەندی گەشەسەندنا دەهاتە وەلام ودوای تەسلیم دەبوو ،دژی چاپ وەستا دژی رادیۆ وەستا دژی چوونە ناومانگ وەستا دژی خویندن (بەعلمی شەیتانی) ناوزەد کرد کەچی دوای تەسلیمی هەموان بوو ،

سەربردەیەك هەیە لە نیوان موفتی عوسمانی(شیخ الاسلام) و گوتاربیژانی ساحیل عاج ڕوویداوە گوزارش لەدواکەوتن ودابڕانی زانایانی ئاینی دەکا لەو جیهانە نوییە ، مزگەوتیك لە ساحیل عاج کرا موفتی عوسمانی هەندی کتێب و چەند ووتارێکی هەینی ئامادەشیان بۆ ناردن وتیایدا دەبوایە دوعای هەینی بۆ پاشای ساحیل عاج بکری، کە ناوی (زنکۆزنکۆ)بوە ،کەچی موفتی عوسمانی و دەوروبەری کەس نەیزانی ناوی پادشای ساحیل حاج ناوی چیە ،بۆیە لەناو کەوانەك نوسیبویان(فلان بن فلان) تا بۆخۆیان پڕی بکەنەوە ، کەچی خەتیبەکان واتیگەیشتبوون ئەوە ناوی خەلیفەی موسولمانانە ، نیو سەدە دوعای هەینی بۆ (فلان بن فلان)دەکرا وەك خەلیفەی موسولمانان ،تا (جمیل عارف)ی وەزیری ئەوقافی یەمەن لەسەردانیکی بۆ ئەو وولاتەو چوونی بۆ نویژی هەینی گوێی لەو دوعایە بوو (خوایە خەلیفەی موسولمانان فلان بن فلان)مان بۆ بهێلی و تەختی بەرز بێت ،ئەوە ئاماژەیەکی مەترسیداری ئەهلی ئاین بوەو گوزارش لە دابڕان دەکا کە تەنانەت خەلافەتیش نەمابوو لەسالی 1924 ەوە کەچی ئاگادار نەبوون دوای 50 سال نەیانزانیە سیستەمی تورکیای ئیستا عەلمانیەو خەلیفە هەر نەماوە .

ئەو بارو دۆخە جیهانی گرتبۆوەو هەمو ئاینەکان لەبارودۆخیکی فەرامۆش کرابوون ،لەهەندێ وولات گەیشتبوە ئاستی دەستوری ، کە ئایین نەیەتە ناو دەولەت یان ئەوەی ئیستا پیّی دەووترێ( ئاینی

فەرمی وولات فلانە ئاینە )،لە پیش هەموان کۆنگریسی ئەمریکی[451] ،ئینجا لە مادەی 116ی دەستوری نەمسا ی سالە 1901،زۆر وولاتی تر یش،بەو دواییە گەیشتە وولاتانی کۆنە شیوعی ،لەوانە:مادەی16ی دەستوری بیلا روسیاسالی 1994،مادەی 11ی دەستوری ئەسیۆبی 1994،مادەی 14 ی دەستوری روسیای 1993، لەجیاتی مادەیەکی دەستوری وەك مادەی(2)ی دەستوری فرنسی تۆماردەکرا: **فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو الدين وهي تحترم كل**[452]، لەزۆر وولاتی تر بەشێوەی جیا وادەهات ، لەدیباجەی دەستوری هندی 1950،مادەی 8ی دەستوری ئەنگۆلیا،مادەی 7ی دەستوری ئازەربیجان ،مادەی 1ی کازاخستان،مادەی 1ی قرغیزیا،مادەی 1ی مەدگەشکەر،مادەی 1ی وولاتی مالی ،مادەی 14ی دەستوری روسیا،مادەی 1ی تاجیکستان،مادەی 20ی دەستوری ژاپۆن ، لەدەستوری تورکیاش هەر ناگۆترێ.

**باری فکری وشارستانی :** **چەند بنەمایەك هەیە بۆ گەشەی تاك وکۆمەلگە ،لە پیشەوەی هەوان ئەکتیڤی و بیرکردنەوەیە لە سبەینێ ،بە پیچەوانەوە سستی وتەمبەلی و بوونت لە ڕابووردوو دوات دەخا ، زۆربەی ئاینەکان تووشیئەو دوودەردە ببون ، دەلێن ئەزیەت وقبول کردنی چەوسانەوە پاداشی ڕۆژی دوای لەگەلە،بیرلە دونیاو نەخشەو پلان مەکەنەوە خوا بە خۆی بۆت دەنیری،لە ح مسیحەوە**

[451] هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کراوە) لەبڕگەی(3)ی مادەی(6) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

[452] دەستوری فرنسا لە4ی ئۆکتۆبەری 1958 دەرچوو 92مادە بوو، هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کراوە) لاگیری ئاینیە بەلام نەیکردۆتە مەرج وەك لەبڕگەی(3)ی مادەی(6) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

نەقل کراوەدەلیّ: ئێوە بیر لە سبەینیّ مەکەنەوە،سبەینیّ خۆی چارەنوستان بۆ دیاری دەکات(فلا تهتموا للغد.لأن الغديهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره )[453]. ئیمامی شافیعی بە شیعر هاتوە:

سهرت أعين ونامت عيون ....في أمور تكون أو لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس ... فحملانك الهموم جنون

إن ربا كفاك بالأمس ما كان .....سيكفيك في غد ما يكون

قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملكوت الله) دەلیّ (بۆیە خواعەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[454] ... لەسەر ئەو بنچینەیە زۆربەی ڕەوشەنبیران و ئەکادیمی و شارستانیەتی نویّ وەك مارکس پێیان وابوو ئاین فاکتەری دواکەوتنە، یان ئامرازە بەدەست برجوازی دژی هەژارو پرۆلیتاریا ، لەگەل زۆر ڕاو بۆچونی سوڕدراو کە وا لەو کۆمەلگە دەکا ئەگەر بیەویّ پێش کەویّ ئەوا دەبیّ خۆی لەو چەمکە ئاینیانە ڕزگاربکات کە بریتیە لە پالدانەوەو بیّ نەخشەیی ، بەوشێوەیەش تا ئەوروپا لێی رزگار نەبوو پێش نەکەوتن ،چونکە بیر نەکردنەوە لە بەیانی دەبتە هۆی وەستانی گەشەو پلان، هەندیّ قۆناغ و تەوەری بنچینەیی لە باریفکری وشارستانی تۆماردەکەین کە یارمەتیدەری دواکەوتنی جیهانی ئیسلامیە بگاتە ڕادەی سستی وخەوالۆیی و بە جیّمانێکی وا زاراوەی (ڕابوون)ی بۆ بگونجیّ لە کاتی بە خەبەر هاتنەوەی :

لەمێژووی ئیسلامی (معاویە) یەکەم هەنگاوی جیاکردنەوەی (قورئان) و (سولّتان)ی داڕشت،گەیشتە ڕادەیەك نەوەو خەلیفەی ئەمەوی باوەڕی بە خودا نەبوو،(ولید بن یزید88-126ه) ئەو خەلیفەیەیە ئیبن قوتەیبەوزۆربەی شارەزایان بە بیّ باوەڕی وەسفی دەکەن[455]، شیعری هەیە گالتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتیّ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەلیّ:

---

[453].كتاب المقدس-العهد الجديد مت(34:6).

[454]روجيه غارودی- ماركسية قرن عشرين-ت:نزيه الحكيم ص146

[455] ابن قتيبة الدينوری- المعارف –تحقيق: ثروة عكاشة ص366، د محمد عمارة لة(المعتزلة والثورة ص72) بـة زةنـديقی وةسف دةكا

تذكرنى الحساب ولست ادرى　　　　احقاماتقول من الحساب

فقل لله يمنعنى طعامى　　　　وقل لله يمنعنى شرابى[456]

لێك جيا بوونەوەی ئەهلی قەلەم (زانایان)وئـەهلی سەیف(دەسـەڵاتداران) ،لـەوەوە کـەمتر فـەقیهو ئاینیەکان بەرەو لای سیاسەت بووینە ، تەنانەت کتیبەکانی سیاسەت بە رەشنوس ماونەوە تا ئیستا چاپ نەکراوە لەبەر گرنگی نەبوونی ،ئەوانەی باسی سیاسەتیشیان کردوە بەو زانستە باس نـەکراوە ، لە کتیبی سیاسە الشرعیە –ابن تیمیە تەنها 3 جار ناوی سیاسەتی بە (سیاسـە الالهیـە –سیاسـە العادلە –سیاسە الصالحە )هێناوە (دوانی یەکەم لـە ص2 هـی سـێیەم لـە (حـد السـرقە) ص20 هـاتوة ... لە سەردەمی نوێ یەکێ لەهەرە کارە ترسناکەکانی ئەو بەرجەستەیە ڕێکەوتنی (محمد بـن عبدالوهاب ) و (حمد بن السعود)لە1737 بەدەست خۆشی بریتانیـا، تیایـدا حـوکم وئاینیـان لێـك جیاکردەوە بەشیوەیەك حوکم بۆ ئال سعود وفەتواش بـۆ زاناکانیـان[457]، وولاتـی عـەرەبی سـعودی لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بوو، بۆیە رەنگە هەلە نەبێ ئەگـەر بلـێین سـعودیە کـۆن تـرین ولاتـی عـەلمانیە لە جیهانی ئیسلامی نەك تورکیا . بە عـەلمانی کردن ولاواز کردنی ئاین لەهەموویان پیشەنگ تر بوە ،لەنامەکانی مس بیل(کە بەدامەزرینەری عیراق هەژماردەکریت)بۆ بریتانیا داوایـەك دەکـات لەنامەی رۆژی 1920/10/3دەلێت با مەرجەعەشیعەکان وئاینیـەکانی جیهـانی ئیسـلامیش وەك دەسەلاتی پاپا قەتیس بکەین لەناوچەیەکی وەك ڤاتیکان ئینجـا سیاسـەتەکانی بریتانیـا لـە عـیراق وناوچەکە سەرکەوتوو دەبێت[458]

لەساڵی 1839 لە سەردەمی (سوڵتان عەبدولمەجید) دەستورێکی تێکەڵ بەنیوە عەلمانی(پیك هـاتو لە بنەماکانی شورشی فرنسی) و نیوە ئیسـلامی داڕژرا، بـۆ یەکـەم جـار لـە مێـژووی خەلافـەت* دەستورێك داڕژرا کە (سەرچاوەی بەتاقی تەنها شەریعەتی ئیسلام نەبێ) ، .

دروست بوونی حیزبی ئیتحاد وتەرەقی تورکی لە 1889لـە یـادی سـەد سـالەی شورشـی فرنسـی

---

[456] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72 .

[457] الاسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثةص37

[458] العراق فى رسائل مس بيل ص188

* لەسەردەمی سەلیمی قانونی (گول خانە )دەرچو دوایش (خگ همایۆنی ..)هەندێ فەرمانی تریش بەلام ئەو شێوازەی وەرنەگرت ببتە شریك لەگەل شریعەت .

دروست بوو، تیایدا بیری نەتەوەیی و لیبڕالی لە جیاتی بیری ئیسلامی داهێنا، دوای بەرەبەرە دەسەلاتی ئاینی پەك خرا بە تایبەتی لە دوای 1908 ولەسالی 1924 بە یەكجاری لادا .

5-لە ناو عەرەبیش كۆمەلیك رەوشەنبیری چالاكی دژ بە ئاین دروست بوون وخۆشیان كردە خاوەنی دۆزی عربی ،لەوانە:(نجيب عازوري، احمد لطفي سيد، ساطع الحصري، اسماعيل مظهر، قاسم أمين، طه حسين، محمد عزه دروزه، سەلامە موسی، انطوان سعادە، علي عبدالرزاق، بطرس بستاني، شبلی شمیل، فرج أنطوان، میشێل عفلق، جمال عبدالناصر..) لەسالی 1918 لەمیسر ڕاستەوخۆ حزب دروست بوو بەناوی (حزبی عەلمانی دوای ناوی گۆڕا بۆ حزبی وەفد(ئیستاش ماوە ) ،

لە جیهانی ئیسلامیدا زۆر سەركردە و سیاسەتمەداری تر ڕۆڵیان بینی لە كۆتایی هێنان بە رۆلی ئاین ، كاریگەرییان لەسەر جیهانی ئیسلامی و عەرەبی هەبووە، لەوانە: سوكارنۆ، نەهرۆ، سۆهارتۆ، غاندی، ... بەو شێوەیەرابوونێكی عەلمانی سەرتاسەری سەری هەڵدا و بەرەبەرە جێی خەلافەت و شەریعەتی ئیسلامی گرتەوە، ولآت لەدوای ولآت پەیڕەوی عەلمانیەتیان دەكرد، خدێوی ئیسماعیل لە 1883 یاسای فەرەنسی هێنا ناو میسر، هەندێ ولآتیش لەگەڵ داگیركردنی لەلایەن رۆژئاوا عەلمانیەتیان هێنا جێی شەریعەت، لەوانە جەزائیر 1830، عێراق و ولآتی شامیش لەگەڵ دروستكردن و داگیركردنی، تونس یاسای فەرەنسی لە 1906 پەیڕەوكرد. مەغریب لە 1913، زۆربەی ئەفریقیاو ئاسیاشی گرتەوە،لەلایەن ئەتاتوركەوە شەش بنەماكەی عەلمانی لای ئەندۆنیسیاش بنەماكانی پانسلیشای عەلمانی جاڕدران، لەلایەن عەلمانیەتی كوردیشەوە هەمان بەڵێنی پێشكەوتنی تەكنۆلۆجی و سەربەخۆیی بە كورد درا. ئەوە مانای پێش كەوتنی وەرگرتبوو.

بەو شێوەیە ئاین وژیان لیكجیاكراوە مەگەر لە كونجیكی مزگەوت یان لە تەسبیحاتی سۆفیەك پیگەی ئاین مابێت .

ڕابوون: بە پێی ئەوبارودۆخەی سەروو جیهانی ئیسلامی ئینجا لە ماناو گرنگی ڕابوونی ئیسلامی دەگەین ، چۆن هۆكارەكانی دواكەوتن قوولایی هەیە ئاواش ڕابوون قوولاییەكی هەیە ، لە تەقەلاكانی كۆمكاری(جامعە) ئیسلامی دەست پێدەكا ،ئەو جامیعەیە شیوەی فەرمی وەرگرتبوو، كەسایەتی

وزانای ئاینی زۆر بەشداریان کردبوو لە زۆربەی ویلایەتەکانی عوسمانی ،لەوانە:ئەبوهدی رفاعی لە شام ،احمدعزەت عابد دیمشق، شیخ محمدتاهیر لە جزائیر،ئەسعەد قەیسەرلی لە مدینە،شیخ فەزلوللە لەملیباری ئەفریقا،حسین بن علی (شریفی مەکە)، لە نزیکیشەوە لەلایەن شێخ سەعیدی نەورەسی لە کوردستان و سولتان عەبدولحەمید و جمال الدین أفغانی و محمد رشید رەزا.[459]، ئەو تەقەلایانە بە ریشەی ئەو ڕابوونە هەژماردەکریت ،چونکە ئەو جامیعەیە بە ئاڕستەی چاکسازی وبەرجەستەکردنی فۆرمیکی نوێی پەیوەندی خەلافەت ومیلەتانی موسولمان بوو، بەلام لەدوای ئەوەی (ئیتحادییەکان-بەو ڕووکارە عەلمانی نەتەوەگەریەیان) بەیەکجاری لە 1908- 1909ز دەسەلاتی عوسمانیان کۆنترۆڵ کردو تەقەلایەش کۆتایی هات بەو فۆرمە .

ئەوجارە تەقەلایەکان پەرتەوازە بوو هەریەکەو لەلای خۆی، تەقەلای دروست کردنی ئەو جۆرە بزوتنەوانە دەست پێکرا، بەپێی چەند سەرچاوەیەك (یەکێتی محمدی) کە لە سالی 1908دروست بوە (یان لە 1909/3/31 وەك هەندیك دەلین) بەسەرۆکایەتی شیخ سعید نورسی یەکەم بناغەی سیاسی بووە، هەرچەندە بەپێی بەلگەنامەکانی ئەرمەنی (یەکێتی کورد) بە ڕابەرایەتی (شێخ عبیداللە نهری)لە سالی 1880دروست بووە بەیەکەمی هەژماردەکەن**، لە ئەندۆنیسیا کۆمەلێکی تر بەناوی ئسیلامی لە 1912 دروست بوە ، لەویلایەتی بەغداش (حزبی نەهزە) لە سالەکانی 1918 دروست بووە، دژی داگیرکاری بریتانی بەناوەرۆکێکی ئیسلامی، لە پێش ئەو میژووەش حزبی تری وەك حزبی ئیسلامی بە سەروکایەتی محمد داغستانی لەسالی 1908وحزبیکی ئیسلامی تر لە سلیمانی لەگەل شیخ محمود بووە، لەدوای داڕووخانی خیلافەتی عوسمانی لە 1924/3/3 بەیەکجاری لەلایەن ئەتاتۆرکەوە، کە بووە هۆی دروست بوونی ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی لەسەر بنچینەی عەلمانی.. ئەوا بەرەبەرە بیرۆکەی دروست بوونی بزوتنەوەیەکی فراوانی ئیسلامی چەکەرە

---

[459] د.علي محمدالصلابی– الدولة العثمانية ص382 .

**لە سالی 1880 لەنەهری کۆبونەوەیەکی فراوان بۆ سەرۆك عەشیرەت وکەسایەتیەکان کراو تیایدا شێخ گوتارێکی ئاینی وسیاسی خوێندەوە وووتی : پێش نزیکەی 6سەدەعوسمانی دەسەلاتی گرتۆتە دەست بیَ دەنگ بووین بەلام ئیستا بەرەو عەلمانیەت دەڕوا حەتمەن تێك دەچێت، کاتی یەکگرتمان هاتوە، بەو شێوەیە کۆمەلەی کورد لەویَ ڕاگەیەنرا ، بۆ زیاتر بڕوانە :جلیلی جلیل– الإنتفاضة و خالفین –صراع على كوردستان.. والكورد والدولة العثمانية .

بوو، تا لەساڵی 1928 لەسەر دەستی (حەسەن البنا) برایانی موسوڵمان ڕاگەیەنرا، لەدوای ئەزموونێكی دوورودرێژ كەمتر ئەو پرۆژەیەی توانی ئەزموونێك بسەلمێنێ بۆیە بزوتنەوەی تریش پەیدا بوون لەدوای چلەكان، لەوانە (جماعە الإسلامیه) لە پاكستان بە سەرۆكایەتی (ابو الاعلی المودودی) و (حزب التحریر الإسلامی) بە سەرۆكایەتی تقی الدین النبهانی، بەڵام هەر نەتوانرا ببێتە ئەزموونێكی واقیعی، بۆیە حسابێكی وای بۆ نەكرا لە ڕەوتی جیهانی،لە ناو شیعەكانیش كەمتر باوەڕیان بە تیكەل كردنی مەرجەعیە ئاینیەكان وسیاسەت هەبوە ، هەلیان گرتبوو بۆ سەردەمی هاتنی مەهدی ، دوای هاتنی بیری ماركسی و مولحیدی تر پالیدان هەندێ جم وجۆل دژ بەوانە ببتە بنچینەیەكی سیاسیش ،مەرجەعیەكانی شیعەی عیراقیش باوەڕیان بە تیكەل كردنی سیاسەت وئاین نەبوە ،تەنانەت خودی (محسن الحكیم)یش كەجاروایە باسی جۆریك لە جم وجۆلی سیاسی دەكریت ، فتوای دژی شیوعیەت هەبوە ،دەقەكەی: (بسم الله الرحمن الرحیم لایجوز الانتماء الی الحزب الشیوعی فأن ذلك كفر والحاد او ترویج للكفر والالحاد اعاذكم الله وجمیع المسلمین عن ذلك وزادكم ایمانا وتسلیما . والسلام علیكم ورحمة الله وبركاته 17شعبان1379[460]، تا شۆڕشی ئیسلامی لەئێران لەساڵی 1979 بە سەرۆكایەتی خومەینی سەركەوتوو بوو ئەو ڕابوونە تەقیەوە،یەكسەریش شۆڕشی ئەفغانستانیش دژی داگیركەری سۆڤیەتی تەشەنەی كرد، ڕاستەوخۆ سۆڤیەت بە 80000سەرباز هاتە ناوجەنگی پالپشتی حكومەتی ئەفغانستان[461]، واتە سەرەتای ڕابوون دەگەڕێتەوە بۆ هەشتاكانی سەدەی ڕابووردوو ،ئەوە ڕای زۆرایەتیە بەلام واچاكە ڕایەكی ئەكادیمیش بخەینە پالێ ،لە زنجیرە تویژینەوەكانی زانكۆی شیكاگۆ كە لە 1988 جاڕدرا یەكەم بەرهەمیان بریتی بوو لە ( Fundamentalsim Observed- &Martin E Marty Scott Appleby- University of Chicago Pressدەلێ لە چارەكی كۆتایی سەدەی بیست ڕابوونیكی هەمو ئاینەكان بەدی دەكرێت ، ئیتر لەوكاتەوە حساب بۆ ڕەوتی ئیسلامی دەكرێ لە هەموو ئاستەكانو ئەو هەمو زاراوەیە سەری هەلدا و ڕابوونی ئیسلامی لەو كاتیەوە زیاتر بەرجەستە بوە .

---

[460] لاهوت السیاسة ص47 و ص94-

[461] ئەو ژمارەیە زۆر نهینیە لە(مذكرات جیمی كارتر- ت:شبیب بیضون ص134) وەرمان گرتوە .

<u>ڕابوون لە زەمینەی لێکجیاکردنەوەی ئاین وسیاسەت:</u> پرسیاری بنەڕەتی لەو بەشە لەدەوری (ئاین وسیاسەت) دەخولێتەوە ، لەدوای سەرهەلدانی ڕابوونی ئیسلامی پرسی پەیوەندی ئاین وسیاسەت تا ئیستا ساغ نەبۆوە ،بەشیك لە ئەكادیمی وئاینی پێیان وایە لە بنەچەدا لەسەرەتای بەشەریەت سیاسەت نەبوە بۆیەش ئەسلیکی ئاینی نیە ، تەواوی سیستەمی عەلمانیەت لەو لێکجیاکردنەوەیە هاتۆتە بەرهەم ،بۆیە لێکجیاکردنەوە دروشمی تەواوی عەلمانیەتە کە جیهانی نوێ (سیاسی-یاسای-ئابووری-فەرهەنگی —شارستانی ..)لەدەست ئەوانە ، بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامی توند ترە ، نەك ئاین وسیاسەت بەلکو ژیان وئاینیش دەبێ لێکجیاکرێتەوە ئینجا پاساو بۆ بوونی عەلمانی دەبێت، قاموسی حزبی بەعس نمونەیەکی توندی دژ بە ڕابوونە زۆر دژی ئیسلامی سیاسی و پرۆسەی بە سیاسی کردنی ئاینەو دەلێ هەندی وولات لەکاتی قەیران لە جهان کردوویەتی بەدوژمنیکی گەورەی ئامانجە نەتەوەییە عربیەکانی هەژمار کردوە[462] ،بۆیە سەرەنجامێکی لۆجیکیە زۆربەی حزب ولایەنە عەلمانیەکانی جیهانی ئیسلامی دژی ڕابوونی ئیسلامی بێت کە دەیەوێ ئیسلام وسیاسەت ئاشت بکاتەوە ،ئەوە ڕای عەلمانی توندە ،هەرچی عەلمانیە هەرە میانڕەوەکانیش پێیان وایە (ئیسلام)ئاینی هەموو لایەکە بە علمانی و شیوعی و سۆشیالیستی ودیموکراسی و چاك و خراپ و ڕەش و سپیەوە ... ئیتر ناکرێت تەنیا ببێتە مولکی کۆمەڵە خەڵکێك و دەشلێن : ئیسلام ئاینە سیاسەت نیە ،کیشەیەکی شەخسیە لە نێوان خۆی و خودای ، ژیانی ئێستا مەدەنیە, گۆڕاوە, ئاینیش دەقەو نەگۆرو کۆنە ، ئاین پەیوەندی ستونی شەخسی خۆی وخوایەتی سەربەستە چۆنی دەکا یان ناکات, ژیانی سیاسی ئێستاش پەیوەندی خەڵك خۆبەخۆ بە رژێمی سیاسیە ، لەگەل کۆمەلیك پاساوی تر :

1-نەك هەرلە ئاستی سیاسی بەلکو لە ئاستی ئەكادیمیش ، کیشە بنچینەییەکە لەوە دیت کە هەندی ئاین بەتەواوی دژی تیکەل کردنی ئاین وسیاسەتن و لەلایەکی تریش لە نیو خودی ئیسلامیش ئەو دەنگە بەرزەی دژبەو تیکەلیە هەیە .

---

462 تعریفات ببعض المصطلحات —مکتب الثقافة والاعلام ص66 ص158.

2-هۆكاری تریش ئەوەیە ڕەفتاری هەندی بزوتنەوەی ئیسلامی لە ناوەندەكانی عربی و ئەوانەی بە عەقلی ئەعرابی كاریگەرن زیاتر ئەو بۆچوونەی (لیكجیاكردنەوەی ئاین وسیاسەت)ی پتەو كرد.
3-تەواوی شارستانیەتی نوێی جیهان لە سیستەمی سیاسی و یاسایی وئابووری وپەیوەندی دەولی و ..لەسەر سیكولاری و لیكجیاكردنەوەی ئاین وسیاسەت هاتوە .

4-ئەوانەی دەڵێن دەبی ئیسلام بگونجینن لەگەل ئەو پیشهاتانە نەك پێچەوانە ،لەو بارەیەوە هەندێ بۆچوونی زانای ئەكادیمی ئاینی یارمەتی ئەو بۆچونەی عەلمانی داوە ، هەولی گونجانی (ئیسلام)یان لەگەل چەمكەكانی سەردەم داوەو ئاوێتەیان كردوون ، وەك (دیموكراسی ئیسلامی)(سۆشیالیستی ئیسلامی)(نەتەوەیی ئیسلامی)[463] ، هەندێ زاراوەی تریش وەك :ئیسلامی چەپی كەلەلایەن (حسن حنفی)داهینراوە مانای ماركسی نیەو نەمانای تیكەل كردنی ماركسی وئیسلامی وەك(مجاهدین خلق)و .. بەلكو دادگەری ودیموكراسی و دەلی لەسەر ڕێڕەوەی (**عروة الوثقی**)ی ئەفغانی ئەویش (اشتراكیە اسلامیە)ی لەبەرامبەر خۆشگوزەرانی هێنا كایەوە،دوایش هەمان(اشتراكیە اسلامیە ) لەلایەن مستەفا سوباعیەوە كرادروشم،لە ئێرانیش لەسەر دەستی علی شریعەتی و تالەقانی بزوتنەوەی (الاشتراكین فی سبیل اللە-یان-نەهزەتی خودایی پاراستن سۆشیالیست) دروست كردلەدوای ئینقلابەكەی دژ بەموسەدیق ، هەروەها ئیسلامی ماركسیش هەیە لە كتیبی (**الكتاب والقران قراءة معاصرة**)هاتوە ..پیشوو تریش مكسیم ڕۆدنسن وتەوفیقی تر هەبوە ، لە نێو زانایانی سەردەمی ئاینیش هەندێ ئاوەلناو دەخەنە پاڵ ئیسلام وادێنێتە بەرچاو كە ئیسلام ناقسە بەوانە تەواو دەكرێت وەك پیویستی سەردەم ، زاراوەی لیكدراوی وەك :(**وسطیة الأسلام**)(اسلامی توندو ئیسلامی نەرم)،( ئیسلامی كراوە)و.. (د. محمد عمارە): باسی (**وسطیة الاسلامي**)دەكا خۆ هەرهەمان باسی ئیسلامە بەڵام ئەو ئەدرێسی پێداوە[464] لە ڕاستیدا (**وسطیة**)سیفەتێكی ئیسلامە نەك ئیسلام هەبێت وەسەتی ئیسلامی و ناوەسەتی, ئیسلامی جیهادی و ناجیهادی, ئیسلامی ئاشتی و ئیسلامی

---

[463] بڕوانە : د ماجد الحلو – الاستفتاء الشعبی بین الانظمة الوضعیة واسلامیة ص64 ..بەلام هەر خۆی ڕوونی دەكاتەوە دەلێت لە ڕاستیدا ئیسلام پیویستی بەو زیادەیە نیە (دیموكراسی ئیسلامی)بەلام بۆ سانایی تیگەیشتن وام كردوە .

[464] **معركة المصطلحات بین الغرب والاسلام ص185**

نائاشتی, ئیسلامی کراوەو نەکراوە ..کەواتە دەکرێ بلێین (موسوڵمانانی وەسەتی, موسڵمانانی توند), ... ئەو ئاوەڵناوە نابێ بچێتە سەرخودی ئیسلام ، بە هەمان شیوە ئیسلامی دیموکراسی وسۆشیالیستی و.. ئەوانە زیاتر یارمەتی ئەو بۆچوونانەیان داوە ، کە کیشە لە خودی ئیسلامە بۆیەش باس لە چاکسازی ئیسلام دەکەن نەك موسولمانان .

ئەوەی زۆر گرفتە لەپیش ڕابوون لەبارەی بەسیاسی کردنی ئاین عەلمانی نیە زیاتر ڕاو بۆچوونی فەقیهە کۆن ونوێیەکانی زۆربەی ئاینەکانە ،کە زیاتر مەیلیان بەلای دوورکەوتنەوەیە لەسیاسەت ، ڕەنگە بێ ویستی خۆیان خزمەتێکی خۆڕاییان بە مەبەستی عەلمانیەت کردووە بۆ دوور خستنەوەی ئاین لە سیاسەت، هەروەك شوبلی عیسەمی دەڵێ: (زانا و پیاوانێکی ئاینی هەن کە زۆر لە ئیسلام قووڵ نابنەوە خزمەتی مەبەستەکانی عەلمانی دەکەن کە پێیان وایە ئایین تەنیا بۆ کاری شەخسی بێت و دوور لە سیاسەت)[465]، قەشە (ولیام )ی ئینگلیزی دەلێ هەمو یاساو شریعەت بۆ خوا نیە خۆ خوا بە تەنها ئەو بوونەوەرە بەڕێوە نابا،لێرە مرۆڤیش دەکاتە شریکی بەڕێوەبردن وتەشریع، لە جیهانی ئیسلامی (شێخ علی عبدالرزاق) (قازی شەرعی)ی ئەزهەر لە ساڵی 1925 کتێبێکی نووسی بەناوی (الاسلام و أصول الحکم) دەلێ: ئیسلام تەنها ئاینی گیانە نەك دەوڵەت، پەیامی محمد هەرگیز دەوڵەت و حکومەتی تیا نەبووە[466] ، ئەوانە هەر لە خزمەتی بیر و بۆچوونی عەلمانیەت نیە، بەڵکو ئیمپریالیزمی جیهانیش بە رۆژهەلاتی و رۆژئاواییەوە ئەوەیان مەبەستە بۆ دەرکێشانی گیانی بەرگری نیشتیمانی، هەر بۆیەش لەگەل داگیرکردنی کوردستان ودروست بوونی مەینەتی کورد دروشمی جیا کردنەوەی ئاین لە سیاسەت هاتووە، یەکەم جار ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی نوێ)کەلەلایەن بریتانیاوەدەردەچوولەدوای 1918- بانگێشەی (ئاین شتێکەو سیاسەتیش شتێکی ترە)ی بلاو کردەوە، ئینجا داگیرکەرەکانی تریش لەهەموان سەخت تر دەسەلاتی بەعس بوو سزاکەی تا ڕاددەی سێدارە بوو،صدام حسین لە کتێبی (**نظرة فی الدین والتراث**)بە توندی جەختدەکا دەلێ: (المطلوب

---

[465] العلمانیة و الدولة الدینیة-شبلي عیسمی ص77.
[466] الاسلام و أصول الحکم ص64-68

مناهو ان نكون ضدتسيس الدين)[467]، هەروەها (میكاڤیلی) و هەمو ڕاڕەوەی ئێستاش زۆر داكۆكی لەسەر ئەو لێك جیاكردنەوەی ئایین و سیاسەت دەكەن[468]، سپینۆزاش دەلێت (ئەركی فلسفە دۆزینەوەی هەقەو ئەركی ئاینیش بەندایەتی)[469]، لەكۆنەوە دەزگا ماسۆنی و شێوە زایۆنیەكان و هەندێ ڕاڕەوی ئیسلامی نەفامیش یەكیان گرتۆتەوە لە دوورخستنەوەی سیاسەت لە ئایین، لە بنەچەدا یەكەم كەس كە بانگێشەی لێك جیاكردنەوەی ئاین وسیاسەتی كرد (سینكا)ی زانای رۆمانی ومامۆستای دیكتاتۆر(نەروین) بوو[470]، لە ئیسلامیەكانیش جار وابووە لەبەر هۆی ناكۆكی ماندوبوون بێئومێدی بە ئەنجامێك گەیشتوون وەك (**أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة**) كە لەلایەن (شێخ سعید نورسی) وتراوە، زۆر بەكەمی لە فقهی ئاینی ئیسلام باسی سیاسەت كراوە ، تەنانەت وای لێهات مانای سیاسەت ودرۆو فێل پیككگرێدرا ، لە نێو كۆمەلگەی عیراقی زاراوەی(بلتیقی) بەكاردەهات وەك جوێن ،مانای(بلتیقە- پۆلتیقە) بە مانای(حیلە باز) هاتوە ،كە لەبنەچەدا لە پۆلیتیكی ئینگلیزی هاتوە ( سیاسە -Politico)[471]، بە هۆی ئەو هەمو فرت وفێل و خواروو خێچیەی لە مەیدانی سیاسی بەدی دەكرێ ، لەلایەكی تریش سەرهەلدانی چەمكی سیاسەت لە مێژووی خەلافەت لە بارودۆخێكی شانازی نەهاتوە ،دەگۆترێ یەكەم بەكارهێنانی چەمكی (سیاسەت دەگەڕێتەوە سەردەمی كیشەی نێوان معاویەو ئیمامی علی،نوینەری معاویە (عمر كوری عاص)بە نوینەری ئیمامی علی (ئەشعەری) ووت(تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان لەلای معاویە سیاسەتیكی دروستە) ..لەدوای ئەوە ئەو چەمكە بەكارهاتوە .

لە ئەسڵدا پرسی سیاسی عەقیدەیە ئەگەر باوەڕت وابێ قورئان هاتوو مرۆڤ (خلیفە) جێنشینی خوا بێت، ئەوا ئاینەكەشی بەرنامەی سیاسیە،هیچ ئاینێك نیە لە بنەڕتا سیاسی نەبووبێ ،بۆیە غاندی دەلێ ئەوەی ڕای وایە سیاسەت وئاین لیكجیایە نە لەئاین گەیشتوە نەلەسیاسەت ، (هۆبز)یش بە

---

[467] نظرة فی الدین والتراث ص14 .

[468] طروحات، میكافیلی.

[469] سبینوزا –رسالة فی الاهوت والسیاسة ص363

[470] موسوعة علم الإجتماع ص339

[471] المعجم الكامل للكلمات والمصطلحات العراقیة المادة: بلتیقة

پیچەوانەی زۆربەی هاوزەمانی خۆی دەڵێت سیاسەت ومەدەنیەت لە مەملەکەتی خواش هەیە ،وەك دەقی تەرجەمەی عربی دەلیٚ(السياسة والقوانين المدنية فى مملكة اللة جزءا من الدين)[472] ، هەرچی ڕای ئیسلامیەکانە دەڵێن ئیسلام سیاسیەو ئیسلامی ناسیاسی مانایەك بۆ ئاین ناهێلیتەوە ،دەشلێن ئیسلامی سیاسی ئەو کۆمەڵە خەڵك و ئەو بزوتنەوانەن کە ئیسلامیان کردۆتە بەرنامەی سیاسی ، خودی ئیسلام سیاسیەو هەر ئەسلی هاتنی مرۆڤ بۆ (تەعمیر) پەیامیکی سیاسیەوهەمو پیغمبرەکانیش پەیامی سیاسیان هەلگرتوە ، بۆیە زاراوەی (ئیسلامی سیاسی)ش هەلەیە . دەلێن سیاسەت وئاین نەك لێکجیانابنەوە بەلکو ئاوێتەن، لەوبارەیەوە د محمدعمارە واباسی سیاسەت دەکا : سیاسەت لە پیغمبەرانەوە هاتوە،دریژبوویتەوە بۆ پادشاو گەدا،ڕوالەتەکەی سیاسەتی مەدەنیە ،لەناوەوەش سیاسەتی دەروونیە کە لە (العلماء ورثة الانبياء)هاتوە،سیاسەتی دادگەری و سیاتی ستەمکاریش هەیە [473] .

**<u>ئاینە سیاسیەکان وناسیاسیەکان</u> :** لەو کورتە توێژینەوەی سەروو دەرکەوت لەبارەی پەیوەندی ئاین وسیاسەت سیٚ تیۆر هەیە ،یەکەمیان دەلیٚ هەمو جۆرە ئاینەکان جیان لەسیاسەت ، دوەم پێیان وایە ئاینی سیاسی و ئاینی ناسیاسی هەیە ،سێیەم دەلین هیچ ئاینیك نیە سیاسی نەبیت مادام ئاینی کۆمەلێکە ،ڕاستیەکەشی ئەوەیە لە ئەسلدا(وەك لەسەروو باس کرا)هەمو ئاینێك سیاسی بوە دوای دەسەلاتدار ئاینی لەسیاسەت دوور خستۆتەوە بۆ ئەوەی دەستی والاٚ بێت ، وەك چۆن دەسەلاتداری چەوسێنەر حەزدەکا خۆی لە یاساو دەستورو چاودێری دوور خراوەتەوە ، ئەو جۆرە تەقەلایە لەگەل هەمو ئاینەکان کراوە ،زۆربەی جار میراتگرانی ئاینەکان خۆشیان ئەوەیان کردوە ، لە زۆربەی ئاینەکان ئەو کاتە سەرکەوتو بوە کە بواری دەستکاری دەقیش کرابێت ،ئەو تەقەلایە دژ بە ئیسلام لە

---

[472] توماس هوبز- اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص126 .

[473] قاموس المصطلحات الاقتصادية فى الحضارة الاسلامية–د محمد عمارة ص299–300

هەمو لایەك کراوە هەتا لەلای هەندێ سولتان وخەلیفەش بەلام بواری دەستکاری قورئان نەبوە بۆیە لە کۆتایی سەرکەوتو نەبووینەو ئاینی ئیسلام نەتوانرا لە حوکم وسیاسەت جیابکرێتەوە .

ئەو تەقەلایە لەگەل تەوراتیش تارادەیەك کراوە سەرکەوتنێکی گەورەیان لێبەدەست نـەهێناوە بـۆ ئاینی یەهودیش بەتەواوی لە سیاسەت دوور نەخرایەوە ،بەهەمو ئارستەیەك لەگـەل ئاینـەکانی تـری زەردەشتی وبوزی وتاوی و کۆنفۆشیۆسی و..کراوە ،لەهەموان زیاتر باسی ئاینی مسیحی دەکریت کە دوور بیت لە سیاسەت وئاینیکی تاکیە لە نیوان خۆی وخـوا هـەروەك( سـپنوزا، تالیـدان، گـاردینی ..زۆری تر دەڵێن: ئاینی مەسیحی بێ شەریعەتە واتە دوورە لەسیاسەت [474]، .. کەچی بە سەرنجێکی وورد تر دەردەکەوێ ئاوا نیە ، ئەگەر وابوایە مۆزائیکیکی ئاینی لەسەر زەوی دروست نەدەبوو ئەوەتا دەبینین ناوەراستی ئاسیاو سـەرووی ئـەفریقا موسـولمانن ،سـەرووی ئاسـیا کۆنفۆشیۆسـین ،ئـەوروپا مسیحین ..ئەو دابەشیە هەیە ،واتە پەیوەندی بە کاری بەکۆمەل هەبوەو هەیە بۆیـە بـە پرۆسـەیەکی سیاسی میژوویی ئەو دیزاینەی ئاینی لەسەر زەوی خەملیە ، زیاتر لەوەش حزبـی سیاسـی مسـیحی هەیە ، لـە فەرهـەنگی مسـیحی مانـای زاراوەی (لیتۆرجیـا)ی لێکدایتـەوە بـەووردی دەردەکـەوی کەمەبەستی ئاینیکی بەکۆمەلە نەك تاکی ، دەلی لیتۆرجی لـەدوو ووشـە پیکهـاتوە ،لیتـۆ مانـای میلەت ،ئیرجیا بەمانای کار ،واتە کاری بەکۆمەل نەك بەتەنیا،تەنیایی فلسفەی ئاینی نیە فلسـفەی وجودی و لیبرالی و تارادەیەك فەرهەنگی سەرمایەداریە ، لە ئینجیلـیش واهـاتوە : (حیثمـا اجتمـع اثنان أو ثلاثة بأسمی فهنـاك أکـون في وسـطهم) [475] ، مـادام ئیشـی بەکۆمـەلیش بکریـت پیویسـتی بەزانست و رارەوی سیاسی دەبیت وکۆی پرۆسەکە سیاسیە ،ئەوەش بە روونی لـە مەزهـەبی کـالفنی بەرجەستە ببوو کە دەیان ووت: بەگەرانەوە سەر پـەیرەو کردنـی حـوکمی خـوای دادگـەری دیتـەدی وکیشەکانی بەشەریەتیش چارەسەر دەبێ ، بەکورتی داوایـان دەکـرد (علـی الإنسـان أن یطیـع الله لا الملوك والأمراء) [476].

---

474 هەرکەسێ ئینجیل بخوینیتەوە ئەو راستیەی بۆدەردەکەوی، سەرەرای ئەوەش لە (جدول و الشروح)ی ئینجیـل پێناسـی دەکـا نالی شریعەتی خوایە دەلی سیرەی مسیحە .

475 کتاب المقدس –عهدالجدید– (مت 18: 20)

476 عبدالوهاب **الکیالي, موسوعة السیاسة ج5 ص134**

**ئاینداری بزێو(ڕابوون):** ئاینداری ڕەوشەنبیر بەو واقیعە کلاسیکیە قایل نابێت کە ئاین رۆڵێکی نەبێت لە ژیانی سیاسی وئابووری وکۆمەلایەتی ..، داکۆکی لە (جماعە) و (حوکمی ئیسلامی) و (حوکم بە قورئان و سوننە) و باسەکانی سیاسی دەکات و ئەرکی شەرعی دادەڕێژێ کە ڕابن ، کۆمەلیك ئایەت وفەرمودە دەکەنە بنچینە بۆ ئەوەی رابوونی ئیسلامی لیبتەقیتەوە ، پشت بەو دەقانە دەبەستن :

((افحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن حكما لقوم يوقنون))المائدة:50. ((ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الظالمون، ..فاسقون،.. كافرون)). ((تبيانا لكل شيء)) ((كذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس..))البقرة/143 ((أفمن يهدي الى الحق أحق أن يتبع أمن لا يهدي الا أن يهدى فما لكم كيف تحكمون))يونس/35. ((ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون))الأنبياء/105. ((الم ترى الى الذين يزعمون أنهم أمنوا بما أنزل اليك وما انزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا الى الطاغوت..))نساء/60. ((ان هذا صراطي مستقيما فأتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله))الأنعام/153. ((ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا))النساء/150. ((سيبلغ هذا الدين ما بلغ الليل والنهار))فقرموودة. ((بدأ الإسلام غريباً وسيعود غريباُ فطوبى للغرباء))فەرمودە. .

ئەو بناغە ئاینیانە ڤاکتەری بە هێزن بۆڕابوونی ئیسلامی. بە پێچەوانەی ئاینی مەسیحی وهەندێ ڕاو بۆچونی فقهی ئیسلامی وینەیەکی ستاتیکی بۆ ئاین کیشاوە .

سەرجەم ئەو هۆیە گشتی و واقیعیانەی سەروو ئەو بەربەستەی نێوان عەقلّ و پەیامی شکاند کە لە مێژووی کۆنی عەقلّی ئادەمیزادەوە بە ناتەبایی و تەریبی هاتبوو، ئەوە وای کرد بوێری دابوو بە (دانتی) و (هوایتهد) و (شبلی عیمسی) زۆربەی عەلمانیەتی ئەو سەردەمەش داکۆکی لە بۆچوونەکەی (ابو علاو المعری- سەدەی 11) بکەن کە دەلّێت: (خەلّکی سەر زەوی یان عاقلّن و بێ ئاینن، یان

ئاينين و بێعەقڵن..) هەروەها دەڵین: سەرکەوتن بۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بۆ ئاین[477]، هەرلەوەشەوە (همنکوای) دەڵێ بەسروشتی خۆی هەمو عاقڵێك مولحید دەبێ،بی عەقلیش ئاینی دەبێ ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بیت پێویستی بە ئەقلێکی لەنگ هەیە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[478]،لە شوێنێکی تر لە(مخطوطات 1854) دەڵیت بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی بووترێ مرۆڤ دەبێ مولحید بێت[479]،واتە بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەڵگە پیویست بە عەقلی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەل پێشکەوتنی عەقلە، رزۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەڵیت:سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقلمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فلسفەی مادی نابن کە تاکە چارەنوسیانە[480]، بەڵام لەناکاو دەرکەوت کە: تەبیعاتە بنچینەییەکانی ئادەمیزاد (فگرە)- یاساکانی سروشت- پەیام- لەسەر یەك هێڵی ڕاستن یەکتریش پاسادان دەکەن، عەقڵیش کۆتایی بە یاخی بوونی بەرامبەر پەیام هێنا، ڕابوونی ئاینی لیپەیدا بوو لەناویشیاندا رابوونی ئیسلامیش لەهەموان زیاتر .

## هۆو پاساوی ڕابوونی ئیسلامی :

لەدوای هەشتاکانی سەدەی ڕابووردوو لە ناکاو بزوتنەوە ئیسلامیەکان سەریان هەلداو بە خێرایی تەنینەوەو گەشەیان کرد، کۆمەلێك تیۆرو بۆچوون سەری هەلدا لەبارەی هۆکارەکانی گەشەی ڕابوونی ئاینی ،لەهەمویان دەگمەن تر بەشێك واسادەیان کردۆتەوە و پێیان وایە بەهۆی شکستی 1967ی عەرەب بەرامبەر ئیسرائیل ..[481]،لەلای ئێمە هۆکارەکان فراوانن لە فلسفەو فکرو زانستەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە کیشە کۆمەلایەتی وئابووری و سایکۆلۆجیەکان ،ئەوانەی خوارەوە هۆکاری بنچینەیین :

---

[477]شبلی عیسمی لە(العلمانیة والدولة الدینیة ص105) دەلیت شیخ محمد عبدەش ئەو بۆچوونەی هەبوە: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل علیه العقل) . هەروەها بڕوانە: مجتمع جدید أو الکارثة- د.زکی نجیب.

111 کارل مارکس-بۆس الفلسفە ص256نامەکەی مارکس بۆئینینکۆف.

479 مارکسیە قرن عشرین ص145

480المثالیة والمادیة وازمة العصر ص95

481 الحرکات الاسلامیة فی العالم ص5 .

1- گۆڕان لەزانستەکان :زانستی کۆنی فیزیا و کیمیا و بایەلۆجیا و گەردوون و تەنانەت زانستی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرە دوورەکە (بیرکاری) لە پشتیوانیەکی ڕاستەوخۆی فیکری عەلمانی وفلسفی مادی بوو، بەڵام لە سەرەتای ئەم سەدەیەو دوای پەنجاکان شۆڕشێکی زانستی گرنگ ڕویداو ڕەوتەکەی وەرگێڕا بەرەو لای ڕاستیەکانی پەیام، بەو شێوەیە ئەو گۆڕانە زانستیە کاریگەرێکی گرنگ بوو لە بەخەبەر هێنانەوەو ڕابوون خودی زانست وبەرهەمەکانی بوەتە بەشێك لە پاڵدانی عەقلی مرۆڤ بەرەو ئاین .

2- شکستی شیوعیەت : شیوعیەت زۆر بەخێرایی گەشەی کردو وەلامی قورسی (بدیلی ئاینی) ئامادە کرد لەسەر ئاستی ئابووری و کۆمەلایەتی وسیاسی و فلسفی وزانستی ..، تەنگی بە سەرمایەداری وئاینیش هەلچنی ،بەڵام لە سەرەتاکانی 1980 قەیرانەکانی ئابووری و میللی زیاتر لەناو وڵاتانی سۆشیالیستی سەری هەڵدا، دوای کۆمەلیك رووداو لە ساڵی 1990 بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری تری کۆمەڵایەتی و سیاسی و سایکۆلۆجی و احوال شخصی،... ئەو سەربازگەیە بە تەواوی ڕما بە مەدرەسەو حکومەتەوە، دیارە حزبە عەلمانیەکانی جیهانی سێیەم بە تایبەتی کوردستانیەکان سەرچاوەی فکری و سەرمەشقی ئەزموونەکانیان لەو مەدرەسەیە هەڵدەقولا لەڕووی فکریەوە قەلۆش بوونەوە، ئێستا حزبە عەلمانیەکان بە دەگمەن ئەندام و لایەنگرێکیان مابێت بەهۆی فکری و بنەماکانی حزبایەتی، تەنها دەسەڵات تاکە سەرچاوەی ڕاگریانە، بەو شیوەیە بۆشاییەکی مەزنی لە گۆڕەپانی فکری وسیاسی دروست کرد، لەگەڵ ئەو شەپۆلەی ئازادی و دیموکراسیەش بەخێراتر بۆشاییەکە دەرکەوت و ڕابوونی ئیسلامی لەجێی بلاو بۆوە.

3- بە هەردوو دیوی زانستی وفکری زەمینەیەکی سیاسی عەقلانی دروست کرد،بەرەبەرە بارودۆخ گۆڕا تەیاریکی عەقلانی بەرەو ئاین لاربۆوە ، لە مەسیحیەتی سەردەمداعەقلانیەت بوە ڕابوون لەسەرخۆی ،هەرلەوە رۆسۆ دەلێت ئاینی مسیحی تەنها باسی ئاسمانە باسی کێشەی زەوی تێدانیە ،دەشلێ بۆدروست کردنی کۆمەلگەیەکی بێدەنگ واچاکە هەموی مسیحی

بن[482] ،کەچی لە ئیسلامدا عقلانیەت دەبێتە ڕابوون بۆ خۆی ، علی عزت بیگۆڤیچ لە کتیبی(الاسلام بين الشرق والغرب) ئەوەی ساغ کردۆتەوە کە بۆچی زیاتر ئیسلام بوویتە میراتگری ڕابوونی ئاینی دەڵێ :سۆشیالیستی لە بنەچەدا لە یەهودی نزیکە لیبرالیش لە مەسیحیەت ، یهودی (السن بالسن ... توندە)سۆشیالیستی و مرکزی هینادی ، مسیحیەتیش (السن بالعفو- ..نەرمە)لیبرالیەت-دیموکراسی هینادی ، بەهەمان شێوە وەرگێڕی کتێبی (رسالە فی لاهوت والسیاسە - سپینیوزا)دەڵێ : ئاینی یەهودی Theses چونکە ئاینێکی تایبەتە و تەنها بەرژەوەندی یەهود,ئاینی مسیحی دژی unti Theses ئاینێکی گشتی بێ ،کە ئیسلامیش هات ئەوا syn Theses بەلام ئیسلام هەردووکیانە[483]: (مهميناً).
بۆیە ئاینی ئیسلام مدرسەیەکە بەبێ هاوبەش لەبەرامبەر لیبرالیەت وسۆشیالست و شیوعیەت, کەچی مسیحیەت و یهودی و ئاینی تر لەگەڵ ئەو مدرسانە پێکەوە یەکتریان تەواوکردووە...بێ پینەو پەڕۆ..لەو قوولاییە ڕابوونیکی (نەرۆژهەلاتی ونەرۆژ ئاوایی) سەر هەلدەدا.

4- هەردوو شۆڕشی ئیسلامی ئێران و ئەفغانستان:زۆر هاوکێشەی ستراتیجی و سیاسی و کۆمەڵایەتیان وەرگێڕا، یەکەمیان گەورەترین قەڵای ڕۆژئاوای تیادا ڕووخا، دووەمیشیان سوپایەکی شکاند کە لە شکاندن نەدەهات بەو (ناتۆ)یەی ڕۆژ ئاواش .

5-نادادگەری لە سەرمایەداری .

6-پیئومیدی لە یەك رەهەندی (مادی) .

7-لە گەل زۆر هۆکاری تری فلسفی و فکری و کۆمەلایەتی وئابووری وسیاسی و ..بوە پالنەریکی مەزن بۆ سەرهەلدان وگەشەی رابوونی ئیسلامی .

---

[482] روسو – فی عقدالاجتماعی ص208

[483] سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسة ،ترجمة:د حسن حنفی،دارالطباعة–بیروت،ط1 ص100

**بەرگری نیشتمانی و ڕابوونی ئیسلامی:**

دوای سەرکەوتنیان لە مەیدانی هەلبژاردن وخزمەتگوزاری و پاکیزە بوون و ...، بە خیرایی قاوغی سیاسی ویاسایشی وەرگرت ، بزوتنەوە ئیسلامیەکانی لیدروست بوو ، بە خێراییش بوونە گرنگترین هێزی نیشتیمانی ئێستا خەریکە ئەو ڕێسایەکەی سەروو بێتەدی کە بەرگری نیشتمانی لە وولاتی موسولمان نیشینەکان تەنیا بە ئیسلامیەکان دەکرێ ، بزوتنەوەی رزگاری خوازی هاوچەرخ بەسێ قۆناغی بەرگری تێپەریوە: یەکەم: لەسەرەتادا کە تەکنۆلۆجیای داگیرکەر سادە بوو و لەتوانای بەرگری جەماوەری نەتەوەایەتی بوو بەرگری بکاو ئەنجامیشی بوو . دووەم: لەگەڵ گەشەی تەکنۆلۆجیا زیاتر ئەوجارە لە توانای ئەو تویژە دەرچوو پەڕیەوە بۆ ئایدۆلۆجیای مارکسیەت و بەرگری کرد وئەرکی خۆی بینی . سێەم: ئێستا کەتەکنۆلۆجیای سەربازی زۆرگەشەی کردووە لەلایەك لەلایەکی تر قورسایی زیاتر کەوتە شارو بە مەدەنی کردنی ژیان، داکشانی دانیشتوان لە گوندەوە بەرەو شار و مەدەنیەت گیانی شۆرشگێڕی خەفە دەکاتەوە، بۆیە لایەنە عەلمانیەکان ناتوانن بە هۆی گوتاری نەتەوەگەری خەلکی بجوولێنن، بۆیە لە کۆمەلگەی وادا پێویستی بەئایدیۆلۆژیەکی بە هێز هەیە ، لەو سەردەمە ئەو ئایدیۆلۆجیە بە هێزەش زیاترلە رابوونی ئاینی بەدی دەکریت ، بۆیە سەرەنجامیکی لۆجیکیە رابەری بزوتنەوە رزگاریخوازەکان زیاتر ئاینی بن . نموونە نوێیەکانی کشمیر, مۆرۆ, چیچان, لبنان, فەلستین, ... نموونەی لبنان وفلستین لە هەموان زەق ترە ، بەرگری و رزگاری کردنی لبنان لە ئەستۆی هەموو لایەکە بە تایبەتی سوپای لبنان, ئینجاش هەریەکە لە حزبە دیمقراتی و سۆشیالیستی و شیوعی و نەتەوە ییە کان میلیشیان هەبووە، بەتایبەتی لەو کاتی، بۆ تەنیا ئەو ئەرکە لە حزب الله و ئیسلامیەکان دەبینین ، یەکەم جاریش عەرەب بتوانێ خاکی داگیر کراوی خۆی بەسەر بەرزی و بێ سەودا وەرگرێتەوە ، ئەوە لەکاتێکایە دەولەتە عەرەبیە نەتەوەییەکان تێکرا نزیکەی 10 ملیۆن سەربازیان هەیە ناتوانن ئەو ئەرکە ببینن .

لە ئیستادا تێکرای عەلمانیەتی پەك خستوە لەبەرگری داگیرکەر، بەڵکو تەنها لە توانای ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ماوە ئەو بەرگریەبکاجاچ سەلبی بێت یان ئیجابی...، بەشیك لە سەرنجی توندی رۆژئاوا لەسەررابوونی ئیسلامی لیرەوەیە ، جیهانی یەکەم(سەرمایەداران) نایەنەوی هیزیکی

بەرگریکەر لە جیهانی دوەم وسییەم سەرهەلبدا بەدیلی یەکلاکەرەوەی تەکنۆلۆجیا بیت .

ئەو هەنگاوە لە جیهانی ئیسلامی دەتوانرێ بگۆترێ دوا سەنگەری عەلمانی بوو کە لەدەستیدا ،کەواتە ئیستا ئەو پرسیارەی ئاخۆ کام لا (لە عەلمانی وئاینی )نیشتمان پەروەر ترن ،وەلامەکەی ئۆتۆماتیکی دیارە ، مەگەر ئەو شێوازە توندی وبەدەویانەی هەندێ لە بزوتنەوە ئیسلامیەکان پەیرەوی دەکەن ببێتەوە پاساو بۆ زیندوو بوونەوەی عەلمانیەت .

بەشێك لە عەلمانیەکان بەرگری نیشتمانی کردووە بەلاّم بەگشتی رێسا هەیە، زۆربەی جار عەلمانی دەست کێشی بۆداگیرکەر کردووەلە مەغریب، جزائر،لیبیا*،سودان، ئێراق کەچی ئیسلامیەکان بەرگریان کردیە لە وانە :شورشەکانی خەتابی لە مغریب،بادیسی و شیخ عبدالقادر لە جزائر،عمر المختار لە لیبیا، شورشی مەهدی لە سودان، شورشی 20بە سەروکایەتی ئایەتوللە شیرازی لە ئیراق..

ئیسلامیەکان خزمەتی گەل و وولاّتیان بەئەرکی شەرعی دەزانن بۆیە خیانەت ناکەن نای فرۆشن، دوژمنی ڕاناکێشن.. کە وایان کردوە ،کەچی عەلمانی وناشیۆنالیزمیەکان جاروایە بە فەرمی وولاتیان فرۆشتوە ، ئتحادیەکان لیبیایان مەزاد کردبوو بفرۆشنە ئیتالیا بە دوو بەلەمی جەنگی ،زۆربەی سەرکردە عەرەبەکان دۆسیەی سیخوڕی و فرۆشتنی وولاتیان هەبوو بەرامبەر وەرگرتنی زیرو جونەیهو پۆست ، زیاتر لەوەش جاروایە پیاوانی ئاینی ئەو ڕۆلە سەلبیەیان بینیوە ،ڕێیان خۆش کردوە ئاینبەکاربێت بۆ قازانجی داگیرکەران ، لەو بارەیەوە ناپلیۆن دەلی نەمتوانی کۆتایی بە جەنگی فاندیە[484] کاسۆلیکیەکان بهێنم تا نەم ووت کاسۆلیکیکی ڕاستەقینەم ، نەمتوانی ئارامی بۆ میسر دابین بکەم تا نەمووت موسولمانیکی تەواوم ،لە ئیتالیا ووتم پاپاییەکی توندم متمانەی کاهینەکانم بەدەستهینا ،ئەگەر بمەوی دەسەلات بەسەر یەهود بسەپینم دەبێ بلیم پەیکەری سلیمانتان بۆ دەهینمەوە.

---

*تەنانەت ئتحادیەکان لیبیایان مەزاد کردبوو بفرۆشنە ئیتالیا بە دوو بەلەمی جەنگی .

[484] **ئەوانە لەفاندی خوارووی فرنسا عاسێ ببون لایەنگری شای فرنسایان دەکرد دژ بە شۆرشی فرنسا .**

**قەیرانەکانی ڕابوون**

پشت بەو واقیعە زانستی وفکری وسیاسیە گونجاوە واڕادەبینرا کە ڕابوونی ئیسلامی بە خێرایی گەشە بکاو سەرکەوتوو بێت کەچی وادەرنەچوو،حزبی تحریر 3 قۆناغی بەگەیشتن بە خەلافەتی ئیسلامی دیاری کردبوو ،قۆناغی ئامادەکاری ئەندامان ،تیکەل بوون لەگەل ئومەو کۆمەلگە ،سێیەم گەیشتن بەدەولەت وخەلافە ..بەو مەرجەی هەر3 قۆناغ نابێت لە 13 سال ڕەتبدات ..تا ئیستاش قۆناغی یەکەمیشیان ڕەتنەداوە .

ڕابوونی ئیسلامی بە سەرسوڕمانەوە قۆناغە سەختەکانی دەرکەوتن و بلاوبوونەوەی بڕی ، بەلام کە گەیشتە قۆناغی بەرپرسیاریەتی لە جیهانی نوێ و ودەسەلات و پرسی شارستانی و ..گرفتی گەورەی ڕووبەڕووبوویتەوە ، بەکورتی ئەوانەن ،وقەیرانە ناوەکیەکان : 1-گرفتە فقهیەکان 2- گرفتی مەزهەبی 3-توندڕۆیی 4-حزبیایەتی .

هەرچی هۆکارە دەرەکیەکانە زیاتر پیلانە (بەشیکی وەیە بەشیکیشی خەیالیە) ، هەریەکەیان لەوانە لە بۆنەی جیاجیا لەو مەوسوعەیە باس کراون ، لە دۆخی نویشیاندا بەشێك لە رابوونی ئیسلامی دژی دیموکراسی وئازادی و پێکەوە ژیان لەگەل کەمایەتی و غەیرە ئاینەکانی تر ،ئینجا ڕوانگەیەکی لەنگ بۆ شارستانی ومەدەنی ..قەیرانی زۆر گەورەی بۆ ڕابوونی ئیسلامی دروست کردوە ، سەرچاوەی زۆربەی ئەو قەیرانانە ئەوەیە عەقلی عروبی وعەقلی ئاینی تێکەل کراوە ،ئەوەشیان لە بەشەکانی (قەیرانی عەقلی ئاینی وعەقلی عربی باس کراوە ) ،سەرەڕای ئەوانەش هەندیکی تر لەو قەیرانانە باس دەکەین بەکورتی :

1- ئەوەی پێی دەووترێ ڕابوون (یان ئیسلامی حرکی) هیشتا کەمایەتین لە جیهانی ئیسلامیدا ، ڕای گشتی بۆ نوێژ و ڕۆژوو و حەج و بەشێك لە حەرام و حەڵاڵ دروست کراوە، بەڵام بۆ بابەتە گرنگەکانی جیهاد، بیروباوەڕی ئیسلامی، فێربوون، حوکم بە ئیسلام،ڕابوونی ئیسلامی ... دروست نەکراوە، بۆیە بە ئاسانی توومەتی بەکارهێنانی ئاین لەپێناو مەرامی پایەو تەخت قووت دەبێتەوە دژیان .

5-زانایانی ئیسلامی کەمتر بەلای کاری سیاسی و دەسەڵات چوونە، بەتایبەتی لەدوای خۆسەپاندنی (معاویە) و ڕاوەدوونانی زانایان وای لێکردوون کەمیش لەسەر سیاسەت بنووسن، جگە لە هەندێ سەرچاوەی دەگمەنی وەك (سیاسة الشرعیة- ابن تیمیة)،طرق الحكمیة، احكام السلطانیة،..بەشێکی زۆریش لەو جۆرە کتێبە بەدەستنووس ماونەتەوە بە هۆی مقەسی سانسۆر یان لە بەر ترسی خۆی[485] ،ئیمامی غەزالیش لە (احیاو علوم الدینیە) بەلای ئافاتی دەسەلاتی سیاسی خراپ دا نەچوە لە چوارچیوەی ئافاتە خراپەکان( آفات الشهوتین شهوة البطن وشهوة الفرج، وكتاب آفات اللسان، وكتاب آفات الغضب والحقد والحسد، وكتاب ذم الدنيا، وكتاب ذم المال والبخل، وكتاب ذم الجاه والرياء، وكتاب ذم الكبر والعجب، وكتاب ذم الغرور) ،لەسەر ئەو بنچیسنەیە (ابن خلدون)ڕەخنەی لە زاناو فەقیهەکان گرتوە ودەلێ دوورترین تویژن لە سیاسەت وبگرە لەواقعیش چونکە زیاتر لەناونوسین وکتیبن نەك ناوکۆمەلگە ، لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دوو هۆی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی ئایین لە سیاسەت و دەسەڵات لێك دوورکەوێتەوە( یەکەمیان هەڵسوکەوتی نیگەتیڤی بەشێکی زۆر لە خەلیفەکان، دوەمیان پەیڕەوکردنی ڕێبازی میکاڤیلی لە ڕێبازی سیاسەتی نوێدا..) لەوەوە وشەی (سیاسەت) بەناوناتۆرە دەزانن و بەخێرایی ڕەتی دەکەنەوەو دەڵێن ئێمە زانای ئاینین سیاسی نینە .

3- سەرهەڵدانی فرەمەزهەب و تەیار و فرە مەدرەسە و فرە لایەنی ئیسلامی، هەڵبەتە هەر فرەییەك بۆ هێنانەدی یەك ئامانج بێ ئەوا دەبێتە (بدیل) بۆ یەکتریش، ئیتر ئاساییە ناکۆکیش سەرهەڵدەدا، ئاکامە نێگەتیڤەکانی گەلێ زۆرە ناژمێرێ لە دووبەرەکی و سەرقاڵ بوون بە یەکەوەو دەبێتە هۆی وەرگەڕانی ڕاستیەکان و جێگۆڕکێی: لاوەکی بۆ جێی بنچینەیی، ئامراز بۆ جێی ئامانج، گۆڕاو بۆ جێی نەگۆڕ، وەختی بۆ جێی دائیم، تاکتیك بۆ جێی ستراتیژ، ناحەز بۆ جێی دۆست، توندی بۆ جێی نەرمی،...

---

[485] بۆ زیاتر بڕوانەپاشکۆی کتێبی (ئیسلام وسیاسەت- ئارام قادر)تیایدا ئەو لیستە دوورو درێژەی ئەو کتابە سیاسیانەی لەلایەن زانایانی ئیسلامی نووسراوەتەوەو بلاّو نەکرایتەوە .

4-دووباره سەرهەلدانەوەی  شۆڤێنیەتی حزبی و ناشیۆنالیزمی (بەتایبەتی ئەو بیرەی گوایە خیلافەت هەر بۆ عەرەبە) وای کردووە تەیاری ئیخوان و تەیاری سەلەفیە جیاجیاکان دژ بەیەکتر لەدژی عەجەم وکورد کاری سیاسی بکەن بە پێشبڕکێی (مزایدە) تا ڕادەی توندوپەڕەگری.

5- گرنگی نەدانی بەشی ئەکتیڤی فقهی ئیسلامی بەفلسفەو فکرو زانست و تەکنۆلۆجیاو هێنانەدی شارستانی ، ئەو خاڵە لاوازانە بەسانایی پەڕینەوە نێو ڕابوون، دیمەنێکی دواکەوتەیی و کلاسیکی پێشان دەدا ناتوانێ ببێتە بەدیل بۆ ماکینەکانی عەولەمە.

6- **لەکۆتاییدا** :بەشیك لە ڕەوشەنبیرو نەوەی نوێ بەو تەفسیرە کلاسیکیەی ئاین رازی نین و وا 3 بۆچون سەرهەلدەدا یەکەمیان دەلیت فقه  سودی نیەو فەرمودەش پەیامی خودا نیە و تەنها قورئان پەیامە ،بەشی دوەم ڕیك پیچەوانەی ئەوە دەلیت دەبی ئیمە لەسەر فقهی ئیمامەکانی کۆن بڕۆین ونابیت دەستکاری بکەین ،بۆچوونی سێیەم دەلیت فەرموودەو قورئان پەیامن وباقیەکەی تر ڕای بەشەرین دەکریت هەلەی تیدا بیت وبۆ سەردەمی خۆی نوسرایتەوە بۆ ئیستا نابیت ، واتە لە دوای پەیام  سود لە فقهی گونجاویش وەردەگیری ، ئەو بۆچوونە دەیەوی لەو دواکەوتنەی ئیستا (کە لەجهان بە جیماون) دەرچن .

هەندێك لەوانەی ڕێگرن لە دەرچوون لە میژوو و هاتن بۆ ئیستاو داهاتوو ....،هەر چوار خەلیفە وئیمامەکانی پیشوو لای موسولمانان خۆشەویستن بەلام زانست وایە دەبێ کارو بۆچوونی ئەوانەش هەلسەنگێنری ، خۆشیان ووتویانە هەلەمان کرد ( ح عمر )ووتی من هەلەم ئەو ئافرەتە راست دەکات ، هەندی دەمارگیر هەن تەنها بلێی ئیمامی عمر یان ئیمامی علی هەلەی کردوە دەبێتە کافر کەچی  معاویە شەڕی ئیمامی علی کردوە دەلێن نابی بلێی معاویە تاوانی کردوەو نابێ بلێی خوا لێی خۆشبێت ... هەمو ئەوانە ناکۆکیە لە میشکی دەمارگیران ڕێگرن لە پیشکەوتن وبەرجەستەی ڕابوون .

**ڕابوون له كوردستان:** له كوردستان سەرباری هۆكارو پاساوەكانی سەروو ،هۆكاری تايبەتی خۆشی هەيه ،زياتر نيشتمانی و داگيركاری ومەينەتی هۆكاری چالاك و سەربار دروست دەكات ،بۆيه ڕابوون لەكوردستان ئاينی ونيشتمانيه.

ڕەگ و ڕيشەی ڕابوونی ئيسلامی له كوردستان دەگەڕێتەوه بۆ هەردوو تەوەری ئاينی ونيشتمانی ، بۆيه زۆر كۆن تره لەئيخوان، سەرەتای تەوەری ئيسلامی دەگەڕێتەوه بۆ سالی 1908ز كاتێ شێخ سعيدی نەوڕەسی ڕێكخراوی (يەكێتی محمدی)دروست كرد(يان له 1909/3/31 وەك هەنديك دەلين) ،نمونەی كۆكردنەوەی ڕابوونی فكری ونيشتمانی لێرەوه دێت ،سعيدنەوڕەسی به (مجدد)يكی فكری ئيسلامی ئەو سەردەمی هەژماردەكريت ،چالاكی نيشتمانيشی هەرلەدوای ئەو بەرواره دەست پێدەكات ، چالاكی ئاينی و نيشتمانی كوردستان دەگەڕێتەوه بۆ سالی 1880، بەپێی بەڵگەنامەی بريتانی ژ:23 –FO.60/441 كه له 1881/10/1 تۆمار كراوه ودەڵێ: يەكەم كەس داوای كوردستانی گەورەی كرد شيخ عبيدالله بوو،كەواته سەرەتای كوردايەتيش هەر ڕەسەنايەتی له ئاينه، ئەركی نيشتمانی كەوته ئەستۆی زانايانی ئاينی هەريەكه له: سيد تەها، مەلا سەليم،شيخ عبدالسلام، شێخ سەعيدی پيران، قازی محمد، هەتا مەلامستەفا، هەمووی بەپێی تێگەيشتنی خۆی خوازياری دەوڵەتێكی كوردستانی بووه كه شەريعەتی ئيسلامی لێ پەيڕەو بكرێت، بۆيه خەڵكه ئاين پەروەرەكه لەو كوردايەتيه بوونه، هەول وتەقەلای مەلا مستەفا له گەل مامۆستای ئاينی و هاندانيان تا لەژێر كاريگەری دەسەلاتی ئاغەو دەرەبەگ بێنه دەر ، ئەوانه زەمينەيەكی زاتی لەباری هێنا بۆ كۆتايی سەدەی بيستەم ولەگەل ئەو هۆكاره گشتيانەی پيشوو باس كرا هەردوو هۆكاری ناوەكی ودەرەكی پيكدێنێ بۆ بەرپا بوونی ڕابوونی ئيسلامی لەكوردستان ، تا سەرەتای سەدەی 21 زۆر گەشەی كرد ، بەلام لەئيستاتووشی هەورازه سەختەكه بوويەتەوه وەك باقی جيهانی ئيسلامی له قەيراندايه .

**قەيرانی ڕابوون لەكوردستان** : هەروەك چۆن بۆ ڕابوونيش هۆكاری تايبەتی هەبوو ئاواش بۆ قەيرانەكان هۆكاری تايبەتی هەيه ، سەرەڕای قەيران وگرفتەكانی جيهانی ئيسلامی ئەو گرفته تايبەتيانەش له كوردستان هەيه:

1. له بنەچەڕا مەینەتی کورد لەسەر دەستی ڕۆژئاوا و بیرەکانی عەلمانی دروست بووە، لە سایکس-پیکۆ 1916، سان ڕیمۆ 1920، قاهیرە 1921..، بەڵام ئەو مێژووە لەچاو خەستی واقیعی ئێستا لەبیرکراوە، وا دەبینرێ داگیرکەر موسوڵمانن، پاڵپشتە بەرچاوەکانیان موسوڵمانن، بێدەنگەکانیش هەر موسوڵمانن .
2. کوردستان داگیرو دابەشکراوە بە سەر سوریا، عێراق، ئێران، تورکیا.. ناویشیان دەوڵەتی ئیسلامە، وا دەردەکەوێ کە مافی کورد لەلایەن ئیسلام خورابێ، بەتایبەتی کاتێ دەبینرێ لەو هەموو مەینەتیەی بەسەر کورد هاتووە لەو وولاتە ئیسلامیانە و جامیعەی عەرەبی و کۆنگرەی ئیسلامی و ڕێکخراوێکی لەو جۆرانە بە هانای کورد نەهاتوون، ئیتر دیمەن و ڕای گشتیەك بەسانایی بیرو ئەقڵی کورد دەوروژێنێ کە هەر ئیسلام چەوسێنەری کورد بووە، لەگەل کۆمەلیك پرسیاری تر لەگەل ڕووداوە نەخوازراوەکان سەرهەلدەداو ئیسلامیەکان بە چاکی وەلامیان پێ نیە .
3. زیاتر لەوەش کە کوردی بی حکومەت وبێ چەك بزانە جیهانی ئیسلامی چی پێکردوە : لەسالی 1963لە هەلمەتی یەکەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەکان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا ، پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفڕۆکەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاکستانیش یارمەتی عێراقیان دا[486]، لە ئەنفالی دووەمی 1988 لەسەرئاستی عەرەبی تەواوی جامیعەی عربی پالپشتی عێراق بوون دژ بەکورد،زیاتر لەوەش هەندی وولاتی عەرەبی دیسان هێزیان نارد بەشداری ئەنفالی کردوە (وەك لە دانپێهێنانی مدیری هەوالگری گشتی بەعس) دەلێت:یەمەن بە لیوای(عروبە)وئوردەنبەلیوای(یەرموك)وسودان بە(متطوعین)ووولاتانی کەنداویش بە یارمەتی مادی بەشدار بووینە[487].
4. زانایەکی تێنەگەیشتووی عەرەبی باسی بزوتنەوەیەکی کورد بە خراپە دەکاو بێدەنگیشە بەرامبەر هەلسوکەوتی بەعس یاخود شۆڤینیەتی عەرەب .
5- کەمتر هیماکانی ڕابوونی ئیسلامی ڕاگەیەنراوێك یا نارەزاییەکیان لێ بینراوە کە لەدژی ئەو تاوانانەی دژی کورد کراون،هەرچەندە هەلوێستی شەخسی هەبووە بەلام بەناوی ئیخوان نەبووە .

---

[486] ڕۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەیلول - ل168
[487] وفیق سامرائی- حطام بوابة الشرقیة ص130 .

6- بینرا لە تەنگانەکانی کورد هەر ڕێکخراوی غەیرە ئیسلامی ولآتانی ڕۆژئاوا بە هانایان هاتن نەك جیهانی ئیسلامی[488]، واتە ڕایەکی نیمچە گشتی دروست دەکا کە (ئیسلام و موسوڵمانان) دۆست و ڕزگارکەری کورد نین، بۆیە وا دەردەکەوێ ڕابوونی ئیسلامی ناحەز بۆ کورد زیاد دەکا،ئەوەش گرفتێکی سەختە لەپێش ڕابوون.

7 – لەدوای هەمو ئەوانە زانیاریەکی فقهی وانەدراوە بەڵگەیەکی (فقهی رزگاری) بۆ مافی چارەنوس کوردستان بە هەق پێش کەش بکا، لەوەش زۆر دەست کورتە ،لەکاتێ دەبینین کۆمەڵێك مادەو بڕیاڕ هەیە لە نیودەوڵەتی هەیە بۆ مافی چارەنوسی گەلان وەك: مادەی (1) و مادەی (55) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان تۆمار کراوە، هەروەها بریارەکانی: ژمارە 1514 خولی(15)لە14/دیسمبر/1960، بڕیاڕی ژ:2105 خولی (20) لە1965ز، بریاری ژ:2625 خولی 25 لە24/ئۆکتۆبەر/1970، بریاری ژ:3070 خولی28لە 1975، هەروەهابریاری 3314سالی 1974... لەهەمان ئەنجوومەن دەرچووە، ئینجا پێشوو لە 14 خالەکەی ویلسونی ئەمریکی لە ساڵی 1918 ولێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی - فەرەنسی لە 1918، بنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917ی رووسی و شۆرشەکانی پێشوی ئەمریکی 1776 و فەرەنسا 1789 هاتووە،زیاتر لەوەش هەر 3 مادەی 62 و63 و64ی سیڤەر و مادەی 16ی ئینتداب بەسەر عێراق و..زۆری تریان هەیە بیکەنە بەڵگەو منەت بەسەر بزوتنەوەی کوردایەتی ودەلین ئیمە بە پالپشتبەوانەو بۆ ئەوانە ئیش دەکەین ئیوە چیتان هەیە لە ئاین بۆ کورد؟!! تا ئیستا ئیسلامی لەکوردستان وەلامی دەوڵەمەندی بۆ ئەو گرفتە کوشندانە نیەلەسەر هەردوو ئاستی فقهی وسیاسی.

8-ئیسلامی عەرەب وناشیۆنالیزمی عەرەب پێکەوە پێیان وایە ئەو سنورانەی لە نێوان وولاتانی عەرەبی دەستکردەو زادەی پلانی ئیمپریالیزم وزایۆنیە لە سایکس پیکۆی 1916 بناغە ڕێژکراوە...،ئەوەیان هەقەو ڕاستە بەڵام کەدێنە سەر هەمان دابەش وسنور لەنێوان عێراق و

---

[488]لەو کاتی کە عەرەب و وولاتانی ئیسلامی گەلە کۆییان لە کورد کردیەکێتی سۆڤیەت سکالآیەکی بەرزکردەوە بۆ نەتەوە یەکگرتوە(رقم E/3809 9تموز 1963 الجلسة 36)تیایدا داوای کرد ئەو پەلامارە عربیەی بۆ سەر کوردستان بە جینۆسایدە لە قەلەم بدرێ .

دراوسێکانی که بوویته هۆی دروست بوونی سنوری دەستکرد له نێوان پارچەکانی کوردستان ئەوا جۆره تەرازوەکی تر بەکاردەهینن .

9-ئەگەر چی قورئان وفەرمووده دوورن له عروبی بەلام فقهەکەی پڕێەتی لەو زانیاریه هەلانەی فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم وکورد .

10-زۆربەی پرۆسەکانی داگیرکەران بەناو زاراوەی کەلتوری ئیسلامیه، وەك ناوی ئەنفال، پەلاماره سەربازیەکانی بەناوی خالد بن ولید، قعقاع، توکلت على الله.

11-ئەگەر چی هەندی بالی رابوونی ئیسلامی بەشداری شۆرشی رزگاری کوردستانیان کردوه بەلام له کۆتاییدا خۆیان نەکرده خاوەنی دۆزی ڕەوای کوردستان .

ئەوانه هەموی دەبنه قەیرانێکی سەختی سەرباری گشتیەکانیش  له پیش ڕابوونی ئیسلامی له کوردستانی .

**(14)**

## seventh chapter الفصل السابع بەندی حەوت

ئەوانەش دەگرێتەوە( سیستەمی وسایە،میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان،ئینتداب ،بڕیارِ 688... ،ریکەوتنامەی ئەمریکی عیراقی ساتران)

لە کۆنەوە پیویست بەدەزگایەکی وەك نەتەوە یەکگرتوەکان هەبوو بۆ لیککردنەوەی کیشە نیودەولەتیەکان،جاران(ساتران-خواوەندیکی کۆنی بابلی وعەجەم)بوە کە کاری لیککردنەوەی شەرِو بەدادگەریانە سنورەکانی بۆ ئیمپراتۆریەکان رِێکخستوە[489] ،لەو سەردەمەش نەتەوە یەکگرتوەکان میساقیکی هەیە بۆ ئەو مەبەستە ، کەپێکهاتوە لە (19) بەند و (111) مادە، بەندی حەوت یەکێکە لە 19 بەندەکە، بەلام وەك زاراوە لە دوای داگیر کردنی کویت1990 لەلایەن عیراق سەری هەلدا،چونکە پالپشت بەو مادەیە کۆمەلێك بڕیارِ لەسەر عیراق دەرچوو ، تیکرِای گەیشتە 65 بڕیارِ.ئیتر ئەو زاراوەیە لە مەیدانێکی یاسایی پەتی پەرِیەوە بۆ مەیدانی سیاسی وسەر زاری میلیش ، بەتایبەتی بۆ کوردستان چونکە زۆرترین سوودی لیّوەرگرت .

میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆئاشتی وهاریکاری هاتوە وەك لەمادەی(1)هاتوە:

المادة 1 – مقاصد الأمم المتحدة هي:

1. حفظ السلم والأمن الدولي، وتحقيقا لهذه الغاية تتخذ الهيئة التدابير المشتركة الفعالة لمنع الأسباب التي تهدد السلم ولإزالتها، وتقمع أعمال العدوان وغيرها من وجوه الإخلال بالسلم، وتتذرع بالوسائل السلمية، وفقا لمبادئ العدل والقانون الدولي، لحل المنازعات الدولية التي قد تؤدي إلى الإخلال بالسلم أو لتسويتها.
2. إنماء العلاقات الودية بين الأمم على أساس احترام المبدأ الذي يقضي بالتسوية في الحقوق بين الشعوب وبأن يكون لكل منها تقرير مصيرها، وكذلك اتخاذ التدابير الأخرى الملائمة لتعزيز السلم العام. حقيق التعاون الدولي على حل المسائل الدولية ذات الصبغة الاقتصادية والاجتماعية والثقافية والإنسانية وعلى تعزيز احترام حقوق الإنسان والحريات الأساسية للناس جميعا والتشجيع على ذلك إطلاقا بلا تمييز بسبب الجنس أو اللغة أو الدين ولا تفريق بين الرجال والنساء.
3. جعل هذه الهيئة مرجعا لتنسيق أعمال الأمم وتوجيهها نحو إدراك هذه الغايات المشتركة.

---

[489] قاموس الخرافات ص137

سایکس پیکۆو سنوری ئیسرائیله، لای دەسەلاتدارانی وهەندێ ڕەوشەنیری عرب ئەو گەلالانە کارەساتی ترە ،لایەنگرانیشی دەلێن تا بەلقان فۆرماتێکی نوێ نەکراو ئەو نەخشە سیاسیە گۆڕاو یۆگوسلاڤیایەکی دەستکرد هەلوەشێنرایەوە ئیستا ئەو ناوچەیە لە ئارامی وپیشکەوتن دان لە بری یەکتر کوشتن ، گرنگی ئەو گەلالەیە لەوەوە هاتەوە جاریکی تر دوای 40 سال گەلالەی هاوسیوەی سەری هەلداوە .

2-**گەلالەکانی (ئەلوف راین-فرانك جاكۆپسن-باراج خانا-رالف بیترز)** : ، گەلالە چاکسازیەکەی بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست به ئاڕستەی ئەوەیە هەر میلەتەو دەولەتێکی بۆ دروست بکری[548] ئەلوفراین لە گەلالەکەی(الشرق الأوسط فی مرحلة الإعمار) دەلێ: ئەو نەخشە سیاسیەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سروشتی نیە بە خوێن تێك دەچێ ، ئەو نەخشەیە تیك دەچی ،نمونە بەدەولەتی خوارووی سودان دەهینیتەوەو دەلی فلستین بە ڕێوەیە،کوردستان دروست دەبێ، پۆلیساریۆ وبەرقە(سیریناریکەی ڕۆژهەلاتی لیبیا داوای جیابوونەوە دەکەن، خوارووی یەمەن ،سونی وعەلەوی دورزی وکورد لە سوریا .لە جیاتی ئەوەی بە ئۆقیانوسێك لە خوێن ئەوە ڕوو بدا بۆ بە پێی (مبدأ حق التقریر المصیر) بە شیرنی ڕوونەدا.

2-**گەلالەکەی فرانك جاكۆبسن** : ئەو گەلالەیە لە ژێر ئەدریسی (العالم الجدید) گوزارش کردوە ،لەهەردوو گەلالەی پیشوو نزیکە ،بەلام ئەو بۆ لای ڕۆژهەلاتی گەورە دەڕوا ،دەگاتە ئازەربیجان وکوردستان و ئیران بەشە فارسەکەی ئەفغانستان[549] .

3-**گەلالەکەی باراج خانا:** بەناوی(الإنفصال قد یکون مفیدا) : ئەویش ڕایەکانی نزیکە لەوانەی پیشوو ودەلێ ئەو سنورانەی دەستکرد بە سنوری خوێن ناو دەباو داوای دەستکاری دەکا و پیش بینی دەکا ژمارەی دەولەتان بگاتە 300 دەولەت ، داواش لە ئەمریکا دەکا چیتر مەسروف لە سایکس پیکۆ وکۆنگرەی برلین نەکات ،نمونەی چیکۆسلۆڤاکیای هیناوەتەوە دەلێ ئیستا ئەو دوو ولاتە وەك

---

[548]الشرق الأوسط-خرائط جدیدة ترسم ص5 -6.

[549]الشرق الأوسط-خرائط جدیدة ترسم ص12-

بران له دواى لێك جيابوونه‌وه‌يه‌كى ئاره‌زوومه‌ندانه[550].

4-**گه‌لاله‌ى رالف بيترز**(له ص23 را ده‌ست پێ ده‌كا) : به‌شێك له ليوارى لبنان وليواره‌كانى سوريا له‌سه‌ر شێوه‌ى فينيقياى كۆن ده‌بنه ده‌وله‌تێكى ئاسايى ، به‌شێكى سورياو لبنان وعيراق ده‌بنه ده‌وله‌تێكى يه‌ككرتوو،خوارووى عيراق له‌گه‌ل هه‌ندێ به‌شى ترى كه‌نداو ده‌بنه ده‌وله‌تێكى شيعه،كوردستانيش له ديار به‌كر تا ته‌وريز وبۆ خوارووش، بيترز به جيا له‌وانى تر پێى وايه ده‌وله‌تى عربى سعودى له‌هه‌موان ده‌ستكرد تره بۆيه نه‌خشه‌ى سياسى ئه‌و ناوچه‌يه‌ش به شيوازى تر ده‌گۆڕێ .له هه‌مو باره‌كان هيشتا قه‌يرانه‌كانى رۆژهه‌لاتى ناوه‌راست زياد ده‌كاو له‌به‌رامبه‌ر هه‌مو لايه‌ك كۆك نين له‌سه‌ر پرۆژه‌يه‌كى ديارى كراو.

ماوه بلێين ئه‌و گه‌لالانه بۆ دارشتنه‌وه‌ى نه‌خشه‌ى سياسى رۆژهه‌لاتى ناوه‌راسته ،بۆ وه‌رگرتنى ئه‌زمونى گه‌شه‌و ته‌نميه‌ى شارستانى گرنگه سود له ئه‌زمونى سه‌نگافوورا وه‌رگيرێ چۆن سه‌لماندى بوون له جيهانى سێيه‌م ميراتى نيه ،قه‌له‌مى خوايى نيه ،ده‌كرى ليى رزگاربيت ، لى كوان سه‌رۆك وه‌زيرانى سه‌نگافورا ،

باس له يه‌كێ له‌و ولاتانه ده‌كا كه له جيهانى سێيه‌مه‌وه په‌ڕيه‌وه بۆ يه‌كه‌م ،هۆكاره‌كانيشى ديارى كردوه (دادگه‌رى —ميانڕه‌وى —پاكى —ديموكراسيوئازادى —خۆبه‌خيوكردن) واته نه‌بونى( كۆمه‌لگه‌ى چينايه‌تى -گه‌نده‌لى —ديكتاتۆرى-تقزمسه‌قافى ) بۆ ئه‌وه‌ى كۆمه‌لگايه‌ك دروست بكات پيويستى به (رعايه الاجتماعيه )نه‌بێت[551] ،خۆمان له بازاڕى ئازاد دوور خسته‌وه كه ببته هۆى دروست بوونى چينايه‌تيه‌ك كه‌مايه‌تيه‌ك زۆرى به‌ركه‌وێ وزۆرايه‌تيه‌كيش كه‌م، بۆدادگه‌ريه‌كه جۆريك له سۆشياليستى ديموكراسى هه‌لبژاردوه كه تايبه‌تمه‌ندى خۆى هه‌يه ،ڕه‌چاوى تاك وكۆ كراوه ،ئه‌زمونى هه‌بوه نه‌وه‌ك سه‌رمايه‌دارى مافى گشتى خواردوه نه‌ه‌ك سۆشياليستيش مافى تاك بخوا ، هه‌مو ئه‌وانه له‌كتيبيكى به‌ناوى (من العالم الثالث الى الاول-قصة سنغافورة 1965-2000) ، له ص21باس له‌وه ده‌كات تيكراى داهاتى تاك له 1000$ بازيداوه ئيستا بۆ 300000$ ، له ص25: له سالى 1959 كه ليكوان بوه سه‌رۆك وه‌زيران داهاتى تاك بريتى بوو له 400$ له سالى 1990 ه‌يشته

---

[550] ه س ص17-

[551] لي كوان — (من العالم الثالث الى الاول-قصة سنغافورة 1965-2000) ص136

ژیانی خەڵکی سەنگافووراکە 30ساڵ پێش دەڵێت (ص30) لە ،بەجێهێشت دەسەڵاتی کە12200$ نەبوە ئێستاش وا لەپێش جیهانەو لە جیهانی سێیەمەوە پەڕیەوە بۆ جیهانی یەکەم ، ..هەمو ئەو نمونانە بۆ ئەوەیە سەنگاپوورا داهاتی نەوتی نیە وا گەشەی کرد ،کەچی رۆژهەلاتی ناوەراست ئەو هەمو داهاتی ژیرزەوی هەیە هەروا ماوەتەوە .

(18)

# مافی ئافرەت حقوق المرأة Women's rights

**ئەوانەش دەگریتەوە (فیمینیزم، جندەر، یەکسانی،دایك سالاری، یادی 8ی ئاداری،سیداو ،کۆنگرەی پکین، ناموس،باندۆرا،شکارەت(شکارتە)** (هاوسەری دەرەکی —Exogamy) ،(هاوسەری ناوەکی- Endogamy )،(هاوسەری تێکەڵ-Mixelmeriag ) ،(هاوسەری ئاسایی —یەك بۆ یەك-Monogamy ) ،(فرە ژنی - Polygamy ) ، (فرە مێردی-Polyandry)، ئەگناتی، کۆگناتی...)

زیاتر مانای یەکسانی کردنی هەردوو ڕەگەزە بە شێوەیەکی گشتی،دژ بە سووك تەماشاکردنی ئافرەت ،مەبەستی نەهیشتنی هەمو ئەو ئاسەوەرانەی لە ئەنجامی تێڕوانینی لاوەکی بۆ مێینە هاتوە ، ئەو مافە لە چوارچێوەی کۆمەلیك مافی مەدەنی تری وەك مافی مرۆڤ ،مافی کەمایەتی ،مافی هاوولاتی مافی ئاینی ...لە دنیای نوێ هاتوە، ئەو مافانە بە مافی سروشتی هەژمار کراون فراوان ترە لە مافە یاساییەکان ،لە ڕووی فلسفی وزانستی پێیان وایە کۆمەلگەی نوێ پیویستی بە تواناي هەمو بەشەریەتە بە ئافرەتیشەوە بۆ بەشداری کردن لە ژیانی سیاسی و تەعلیمی و زانستی و .. ،چەندین جارنامەو یاساو ریکەوتنامەی نیو دەولەتی بۆ بەستراوە .. . تا لە 8ی ئاداری 1909 ڕاشکاوانە ترین تەقەلای بەدەست هێنانی ئەو مافە لەلایەن خودی ئافرەتەوە ،بۆیەش بوویتە یەکەم وەرچەرخانی مێژووی مافی ئافرەت و یادی دەکریتەوە،ئیتر لەو کاتیەوە بە دەیان بزوتنەوەی ئافرەتی بۆ ئەو مەبەستە سەری هەلداوە و زاراوەو چەمکی مافی ئافرەت سەری هەلداوە ، هەمو ئەوانە پێی دەووترێ مافی ئافرەت .

یادی 8ی ئادار رۆژی 8ی ئاداری هەمو سال رۆژی ئافرەتانە کەلەبنەچەدا لە ئەمریکا هاتوە ،لە بۆنەی سالانەی نەتەوە یەکگرتوەکانیش تۆمارکراوە ، بەلام یادکردنەوەکەی تاڕادەیەك ساغ نەبویتەوە لە نیوان هەردوو مەدرەسەی سۆشیالیستی و سەرمایەداری ئاخۆ کامیانن ئەورۆژەیان وەك یاد کردۆتەوە ،بۆیە سەربردەی هەردوولا تێکەل دەکەین ، کە عادەتەن لە ڕاپەڕینەئافرەتیانەکەی 1856ی نیۆیۆرك دەست پیدەکا کە داوای چاکسازی بارودۆخی ئافرەتانیان کردلە کارو ریزو

هەلویستا ،بەلام پۆلیس بەتوندی وەلامی دانەوە ودەنگی دایەوە ، رۆژی 8ی ئاداری 1908 لەهەمان شار ئەو ڕاپەڕینە ئافرەتیە کرایەوە ، بۆیە ئەو رۆژە دوای کرا بنچینەی ئەو یادە ، هەرلە ئەمریکا جاران حزبێکی سۆشیالیستی هەبوو خاوەنی ئەو جۆرە پرۆژانەی ئافرەت بوە ،ئەو یەکەم جار رۆژی 28شوباتی هەمو سالێك دەکردە یادی ئافرەتان تا سالی 1913 وابوو ،دوای لەسالی 1910 لە کۆنگرەیەکی سۆشیالیستی ئینتەر ناشیۆنالی زیاتر لە 100 ئافرەتی جیهانی بەشداری کرد، بەلام رۆژێکیان دیاری نەکرد بۆ ئافرەتان ، لە سالی 1911 بۆ یەکەم جارلەرۆژی 19ی ئادار یادی ئافرەتان کرایەوە لە ئەلمانیاو دانیمارك وسویسراو نەمسا بە پێی کۆنگرەی کۆبنهاگنی سالی پیشوو ، داوای مافی دەنگدان وکارو پۆستیش کرا بۆیان ،لە 25ی هەمان مانگ لە ئەمریکاش ئەو یادە کراوەو بوە هۆی توندوتیژی دژی ئافرەتان و زیاتر ئەو دۆزەی گەورە کرد ، لە دەوروبەری جەنگی جیهانی یەکەم ئەو بزوتنەوەیەی ئافرەتان گەیشتە رووسیاش ودوا یەکشەمی مانگی شوباتیان کردە رۆژی ئافرەتان ، ، لەدوای شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917سەرکردەی سۆڤیەتی لینین جارِی یەکسانی ژن وپیاوی دا لە لەمادەی 122 و123ی دەستوری[552]،دوای هەمو ئەوروپای گرتەوە، دەشلێن یەکەم جار لە کۆنگرەیەکی یەکیتی ئافرەتانی دیموکراتی جیهان لە سالی 1945 گریدرا کە ئافرەتانی سۆشیالیستی زۆربەی وولاتانی جیهان بەشداربوون ،ئەورۆژەیان(8ی ئادار)یان کردە یاد،دوای هەمو ئەوروپالەسەسەر 8ی ئادار ڕێکەوتن وەك رۆژی جیهانی مافی ئافرەتان کە لە 8ی ئاداری 1909 ی ڕێپیوانەئافرەتیەکەی نیۆیۆرك هات ، لەسالی 1975 نەتەوە یەکگرتوەکانیش ئەو رۆژەیان لە یادەکانیان تۆمارکر، دوای لە 1977 جەمعیەی عامەی نەتەوەیەکگتوەکان داوای لە هەمو وولاتان کرد ئەو رۆژە بکەنە یادی فەرمی .

<u>سەربردەی مافی ئافرەت</u> : لەکۆنەوە باس لە ئافرەتیك بەناوی (لیستراتا)ی یۆنانی دەکرێت جاریکیان مانی گرتوە دژی پیاوان وشەڕی نێوانیان ، لەدوای ڕینسانس و ڕاپەڕینی ئەوروپا مافەکانی مرۆڤ ومندال وئافرەت ومیلەتان ورەشپیست و..سەری هەلدا،لەهەموان سەرنج ڕاکیشتر مافی ئافرەتان بوو ،کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە مێژوودا فەرامۆش کرابوو یان هەر هەست بەو مافەی نەکراوە هەتا

---

[552]بڕوانە : القانون والإشتراكية ص35 .

لەلای خودی ئافرەت خۆشیەوە،هەرچەندە لە ئاینەکان ئەو مافە لە چوارچێوەی دادگەری بەرجەستە بوە بەلام لە دوای کەم ترین لادان ئەو مافە بزر بوویتەوە ،یان دەتوانین بلێین پیش هەمو مافێك مافی ئافرەت پیشیل دەکرا.

لە گەرمەی شۆرشی فرنسی 1789ز خۆپیشاندانیکی ئافرەتی لە ژێر دروشمی (ئازادی —یەکسانی-برایەتی) کرا، دوایش رێکخراوی ئافرەتان دروست بووە، بەلام ئەو مافە بە زەقی لە ناوەڕاستی سەدەی 19 سەری هەلدا ، یەکەم کۆنگرە بۆ بەشداری کردنی ئافرەت بۆ دەنگدان لە ئەمریکا ەسترا لە 1848ئانی (سانتۆن،مۆت،ئەنتۆنی،جریمکی ، ..) بەشدار بوون ،بەلام وەك سەربردەکەی ڕیشەی کۆن ترە ،یەکەم بەلگەنامە بەردەست بێت داوای یەکسانی ژن وپیاوی کردبێ ،لە جاڕنامە کەی(مافی ئافرەتان لە 1791)ی (ئۆلیمپ دی جۆجیە) فرنسی کە پێك هاتبوو لە 17 مادە ،لە مادەی یەکەمدا داوای یەکسانی دەکرد دەقی مادەکە بە عربی ئەوەیە : المادة (1) ((أن المرأة ولدت حرة, وتحيا حياة مساوية لرجل في الحقوق, ويجب أن يقوم التميز الاجتماعي فقط على المنفعة العامة)) ،**هەر**یەکەم جاریش مافی ئافرەت لەو جاڕنامەیە هاتوە،یەکەم کتێب لەو بارەیەوە خاتو(سیمۆن دی بۆفوار) بە ناوی (**الجنس الثانی**) نوسراوە[553]، لە کۆتایی سەدەی 19 بەو لاوە ئەو تیۆرانە بوونە جم وجۆلی ڕێکخراو لەئەوروپا وئەمریکا ، خۆی لە نارەزایی وداوای مافی ئافرەتان نواند ، چەندین کۆڕو کۆنگرە کرا، دوای لەگەل گەشەی مارکسیەت و شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 زۆر گرنگی بەو کێشەیە درا وڕیشەیەکی فلسفی وئایدیۆلۆژی پێدرا (یەکیتی ئافرەتانی دیموکراسی جیهانی) وەك گەورەترین ریکخراوی ئافرەتی لەسالی 1945 دروست بوو 200 ملیۆن ئەندامی هەبووزیاتر لە 100 ولات[554] ، لەنیوەی سەدەی بیستەم ئەو ڕاپەڕینانە سەرتاسەری ئەوروپا- لەئێرلەندا تا ئوسترالیای گرتەوە ،داوای ڕێز گرتن وماف و بەشداری ژیانی کۆمەلأیەتی وسیاسی دەکرا ، لە بەریتانیا ناوی

---

[553] تێبینی ئەوە بکە نوسیومانە یەکەم کتێب لەو بارەیەوە ،ئەگینا بە دەیان کتێب لە بارەی ئافرەت لە فقهی ئیسلامیدا هەیە ،پێش هەمو ئەوانە ئیبن روشد داکۆکی لە مافی ئافرەت کردوە .

[554] القاموس السياسي — بونو ماريوف ترجمة واعداد -- عبد الرزاق الصافي ص48 .

(میسز پانك هریست) وخانەوادەکەی بەو بزوتنەوەیە ناوزەد دەکرا⁵⁵⁵،یەکەم جار لە ویلایەتی وایۆمینگی ئەمریکی سالی 1869مافی دەنگدانیان پێ درا ،بەڵام تا سالی 1920 ئینجا دەستوری فیدرالی ئەمریکی ئەو مافەی تۆمار کرد، لە نیوزلەندا سالی 1893،لە ئوستراليا لە 1902،نەرویج وسوید ودانیمارك لە 1913،،کەنەدا1917،بەریتانیا و نەمساو پۆلەنداو مەجەرو چیکۆسلۆڤاکیا وروسیا هەموی لە 1918 ، بەلجیکیا 1945، هەرچەندە فرنسا سەرمەشقی عەلمانیەت وفەرهەنگی نوێی ئەوروپی بوو بەڵام تا سالی 1946 مافی دەنگدانی بە ئافرەت ڕەوا نەدەبینی ،دوای لە مادەی (2)ی دەستوری سالی 1958 بە فەرمی تۆمارکرا،لە نێو عەرەبیش لەو جۆرە بزوتنەوانە یەکەم جار لە میسرسەری هەڵدا ،لە سالی 1908 کۆمەلەیەك دروست بوو بەناوی (جمعیه حقوق المرأه) ، هەریەکە لە هودا شەعراوی وقاسم ئەمین بە پێشڕەوی بزوتنەوەی ئافرەتانی عەرەب هەژمار دەکرێ ،یەکەم خۆ پێشاندانیان لە 20/مارس/ 1919سازکرا ،دوایلە 1924یەکێتی ئافرەتانی میسریان دروست کرد، دوای بە فەرمی بەپێی مادەی(31 و61)ی دەستوری میسری 1956مافی دەنگ ویەکسانیان پێ درا.

<u>بە یاسای کردنی ئەو مافە</u> : بزوتنەوەی(مافی ئافرەتان)لەوسەدەیە یەکەم جارلەوە هات کە مافی دەنگدانیان هەبێت[556] دوای گەشەکردن بووە کۆمەڵێك داوای تریش بۆ ئافرەت و یەکسانیان بە پیاو لە دروستکردنی ڕێکخراوی سەربەخۆ وبەشداری ژیانی سیاسی و مافی کەسێتی لە خێزانداوزۆر لقی تری لێبۆوە .

لە سەر ئاستی جهانی و یاسای نێو دەولەتی یەکەم جار لە ڕێکەوتنامەی لاهای 1902 باس لە کێشەکانی ئافرەت کرا ،دوای لە رێکەوتنی (قەدەغەی بازرگانی بە ئافرەت)لە 1904 و1921و 1933،دوای لە ڕێکەوتنی(مافی سیاسی ئافرەت ) لە 1952،بڕیاڕی ژ:1921ی ڕۆژی 5/کانونی یەکەمی/1963ی نەتەوە یەککگرتوەکان، ئینجا ڕێکەوتنی (قەلاچۆی جیاوازی

---

[555] بڕوانة : السمحراني - القاموس السياسي ص470.

[556] الموسوعةالعربية العالمية — الموسوعة السياسية .

دژی ئافرەت –سیداو) لە1979،دوای ڕێکەوتنی (دەرکێشانی توندو تیژی دژ بە ئافرەت )لە1983 .. تا دەگاتەکۆنگرەکانی مکسیکۆ لە 1975 وە کۆبنهاگن لە1980 و وپکین لە 1995..،لە چوارچێوەی جاڕنامەکانیش لەمادەی (13 -لقی ب) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و جاڕنامەی (مافی مرۆڤ-بەتایبەتی مادەی2 ومادەی 16)، هەروەهاجاڕنامەی(میساقی مافی ئافرەت)لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە1954/7/7، لە هەموان توند تد تر ڕێکەوتنامەی سیداوە[557]کە داکۆکیەکی زۆر بەتوندی لەیەکسانی ودابەشی دەسەڵات لەنێوان ئافرەت وپیاو دەکا لەنێو یەك خێزانیش، دوای دوو سال نەتەوە یەکگرتوە کان خاوەنداری ریکەوتنامەی (سیداو)ی کرد وکردیە بەشیك لە ریکەوتنی دەولی بۆ جیەجیکردن لە 3سپتمبری 1981 ، لەخودی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکانیش جاڕی یەکسانی مافی ئافرەت وپیاودراو بەند کرا بە مافی چارەنوس[558] ،دوا هەنگاویشی قەڵاچۆی هەمو جۆرە جیاوازی ودژایەتیەکی نەژادی ئافرەت لە خولی (54)ی نەتەوەیەکگرتوەکان لە15/ئۆکتۆبەر/1999 جاڕدرا کە لە 21مادە پێك هاتبوو، لەدوایدا بەرە بەرە ئەو یەکسانیە داوا کرا وڕاپەڕینی لە پێناو کراوە ، لە هەموی گرنگ تر لە لقی (ب) مادەی (13)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان داکۆکیەکی بەڕاشکاوانە لە یەکسانی ژن وپیاو دەکا ،دەقی مادەکە:(إنماء التعاون الدولی فی المیادین الإقتصادیة والإجتماعیة والثقافیة والتعلیمیة والصحیة والإعانة علی تحقیق حقوق الإنسان والحریات الأساسیة للناس کافة بلا تمیز بینهم فی الجنس او اللغة اوالدین ولا تفریق بین الرجال

---

[557]ڕێکەوتنامەی سیداو کورت کراوەی(ڕزگاربوون لە هەموو جۆرە جیاوازیەك لە دژی ئافرەت) لەسالی 1979گرێدرا دوای لە28/کانونی یەکەم/1979لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان بە کۆی دەنگی 130 وولات لایەنگیری و10ش دژ پەیرەو کرا،پێك هاتوە لە 30 مادە ،ئەوەی لێی دەخوێندرێتەوە بریتیەلە:1-داکۆکیەکی پەڕەگر لە یەکسانی 2-گویَ بەسەرەنجام وڕێکخستنی خێزان نادات 3- دان بەوە نانیَ کە سەرەك خێزان وبرەپرسی یەکەم هەبێت ..لەگەل هەندیَ خالی تریش

[558]بڕوانە دەقی بڕیاری ژ:1514 ی خولی 15 ی ئەنجومەنی ئاسایش 14/دیسمبر/1961

والنساء )[559] ،هەروەها کۆمەڵێك بڕیارو ڕاسپاردەی نیودەولەتی تریش لەوانە:( إعلان القضاء علي التمييز ضد المرأة الصادر عن الأمم المتحدة في 7/11/1979 ...هەروەها (إتفاقية القضاء علي جميع أشكال التمييز ضد المرأة ( المادة 16) - 18كانون الأول 1979)هەروەها (البروتوكول الإختياري الملحق بهذة الإتفاقية والصادر في 22كانون الأول 2000وفقاً لأحكام المادة 16) هەروەها(الإعلان العالمي بشأن حماية النساء والأطفال في حالات الطوارئ والنزاعات المسلحة رقم (74/3318) هەروەها (قرار مجلس الأمن رقم 1325(لعام 2000) ،هەروەها(الأتفاقية الدولية بشان الحقوق السياسية للمرأة (8/3/2003) هەروەها(رسالة الأمم المتحدة بشأن يوم المرأة العالمي (8/3/2004) هەروەها(تقرير منظمة العمل الدولية الصادر في 29/3/2004حول المساواة في فرص العمل بين المرأة والرجل)و زۆری تر ... ،دوای لە زۆربەی دەستورەکانی وولاتانی جیهان تۆمار کرا ،دوای هاتە نێو دەستوری وولاتانی ئیسلام نشین ،لەوانە دەستوری میسر (مادەی 16)،دەستوری بەحرەین –مادەی(5)و زۆر وولاتی تریش .

## بارودۆخی ئافرەت پیش ئەو مافە

**ڕیشە فلسەفیەکەی :** لەراستیدا زانایانی (پەرەسەندنی- **تطوری** ) کۆمەلایەتی وەك ( لوپۆك . پاخوفن – مالکینان – باستیان – جیر – والکیز ..تا لامارك وداروین)، بەتایبەتی (مۆرگان) لەکتێبی ( (system of eans angaimty and aftarniy) بۆچونیان ئەوە بوو کە ئادەمیزادبە کۆمەڵێك بنەمای مرۆڤایەتی دروست نەبوە ،بەلکو ئەوە تەتەورورێکەوتیکی دەگمەنە بەستەزمانیك لە ململانێی دنیای ئاژەل هێناوەتە بون، دوای ماوەیەکی دوورودرێژ ئینجا پەڕیتەوە بۆ کۆمەلگەی سەرەتایی نیمچە دڕندەیی ، ئەنجلس قوناغی سەرەتایی کۆمەل دەکاتە سێ بەش و هەل و مەرجی کۆمەلایەتی لەسەر بنچینەی پەیوەندی جنسی بەو شێوەیە دابەش دەکات و دەلیت: (الطور الوحشية

[559] بڕوانە :دەقی (میثاق امم المتحدة ) لە 19 بەندو 111 مادە پێك هاتوە .

= زواج جماعی)[*] ،(البربریة =الزواج الثنائی) ،(الحضارة -= الزواج الاحادی )،یان بەشێوەیەکی میانڕەوتر: فرە مێردی -دایك سالاری،فرەژنی-باوك سالاری ،تاك مێردی دەسەڵاتی هاوبەش[560] ، بەپێی ئەو ڕوانگەیە بەگشتی کۆمەڵێك بووینە پەیوەندی ئادەمیزاد بەیەکەوە زۆر لاواز بووە، هەریەکە ژیانی ڕاوچیەتی بۆخۆی بووە، چ پیاو چ ئافرەت کەس لێپسراوی کەس نەبووە،رۆڵی ماسولکەو بازوو و هێزگرنگ بوە ،لێرەوە رۆڵی لاوازی ئافرەت بەرجەستە دەبێت ،دەشلێن دوو غەریزەی بنچینەی لەکاردا بوو: یەکیان خواردەمەنی و دەوومیان جنسی ، هەر ئافرەتێك دەربکەوتیبایە یەکسەر لەلایەن پیاوەوە ڕفێنرابوو ،وەك(جۆن ماکلنین)لە کتێبی (الزواج البدائی) وای باس دەکا، بەو شێوەیە خێزان و یاساو مرۆڤایەتی نەبوو ،منالان بەدایکیان دەناسران و باوك دیار نەبوو چونکە ئافرەتەکە تاسەر دیار نەبوو لەلای کێیە ، ئەو قۆناغە یە پێی دەوترێ دایك سالاری ، یەکەم کەس ئەو ناوەی داهێنا (باخۆفن 1815-1887)ی سویسری بوو لەکتێبەکەی(حق الام)[561] ، سەرەڕای ئەوەش بەرای مارکیسزم لەو قۆناغەدا ئافرەت و پیاو یەکسان بوون هەریەکە پایەی بەرهەم هینانی سەربەخۆی هەبووە ،دوای ئینقلابی لەسەر کراو بێ ماف وچەوسایەوە بوەلەوبارەیەوە مارکس دەلێت: (یەکەم دابەش کردنی ئیش لەنێوان پیاو و ژن بووە لەپێناو زاوزێ)[562] ئەنجلس لەکتیبی (اصل العائله والملکیه الخاصه والدوله)زیادی دەکاو دەلێ:(یەکەم ناکۆکی چینایەتی لەمیژوودا هەلکەوت لەمل ملانی نێوان ژن و پیاو -( ان اول تعارض طبقی یتوافق زمنیا مع تطور التناحر بین رجل والمرأة فی اقتران الزوجی ،واول اضطهاد طبقي یتوافق زمینا مع اضطهاد الجنس الذکر لجنس الانثی) ،لەوەوە مافی ئافرەت کەوت ،ئیتر چەمکی هاوسەری بریتیە لە ململانێ

---

[*] ئەگەر ئافرەتان ئاوا بە ووردی تێبگەن کە دایك سالاری ووەحشیەت وفرە مێردی پێکگ وەبەستراون هەرگیز باس لە دایك سالاری ناکەن ،چونکە سوکایەتیە پێیان .

[560] بۆ زیاتر بڕوانە : ئافرەت لە ڕوانگەی عەلمانی وئاینی هەروەها بڕوانە : غافن هامبلی-المرأة فی العصور الوسطی ص86..ئەو زاراوەنەیان لێ دەبینی : (هاوسەری دەرەکی –Exogamy) ،(هاوسەری ناوەکی-Endogamy )،(هاوسەری تێکەڵ-Mixelmeriag ) ،(هاوسەری ئاسایی –یەك بۆ یەك-Monogamy ) ،(فرە ژنی -Polygamy ) ، (فرە مێردی-Polyandry)..

[561] بە پێی (**مقدمة فی انثروبولوجیة الإجتماعیة ص31** ) ئەویش سودی لە هیرۆدۆتس وەرگرتوە .

[562] کارل مارکس-أیدیولوجیة الألمانیة ص32 .

و زال بوونی نێر بەسەر مێ ، لەوەش زیاتر (فیرك فیرج) دەلیت :( چەندین هەزار سالە خێزان بریتی بوە لەشانۆی جەنگی نێوان پیاو و ژن).. ،هیچ شەریعەت ویاساو نەریتێك نەبوە پاریزگاری لێبکات .

**ئافرەت لەکۆمەلگەی نێرینە** : لە ڕاستیدا ئافرەت لە کۆمەلگەیەك مافی دەکەوێ کە بەرهەمیان بە دەست وبازو ماسولکە بێت وفەرهەنگیشیان بریتی بێت لە نێرینایەتی، یان بەدیوێکی تر ئافرەت لەکۆمەلگەو خێلی جەنگی لاوازە،واتە ئافرەت عەیبەو سەرشۆڕی بێت ،ئیتر ئەو ئافرەتە لەو کۆمەلگەیە نابێتە پیشڕەو سەرکردە نە لە بواری بژێوی نەلەبواری جەنگی ..ئەو دوەش لەو کۆمەلگەیە گرنگن ،مادام جەنگاوەرێکی چاکیش نەبێت ئەوە خزم وپەیوەندی پشت لەسەر بنچینەی ئافرەت دروست نابێت ،وەك دروست نەبوە، بەلکو زۆربەی کوتلە بەشەریەکان لەسەر بنچینەی نێرینە دروست بوینە ،هەر لە بنەمالەو خیل وعەشیرەت تادەگاتە نەتەوە و باقی بەرهەمە میراتی وستونیەکانی کۆمەلگە ..بۆیە ئافرەت لەو جۆرە کۆمەلگەیە زۆر پەراوێزە،بگرە گەلێ جار تاوان بارو زیادە بوە ، وەك لە کۆمەلگەکان بەگشتی وهەندێ ئاین لەسەروو باس کرا ، هەربۆیەش عەرەبی مەرد پیش ئیسلام زیندە بەچالی ئافرەتی دەکرد ، ئەو کاریگەریە هەندە بە هیز بوە لە دوای هاتنی ئیسلام جاریکی تر گەڕاوەتەوە ناو فقە بە جۆریکی تر، ئافرەت بە فتنە وەسف کراوە ، ئێ لە قورئانیش (الفتنە اشد من القتل) کەواتە ئۆتۆماتیکی ئافرەت حوکمی کوشتنی لەسەر دراوە یان بەلای کەمی خودی نەژادی ئافرەت توومەتە، بۆیە دەبینین لە جیهانی ئیسیلامی (بەتایبەتی عربی)کوشتنی ئافرەت ئەوەندە زەحمەت نیەو زۆر ڕێگریش نیە ،هەندی لە فقهەکان ڕێیان داوە ئافرەت بکوژرێ ئەگەر ناموسی بردی ، یان لەزۆربەی دۆخەکان ئافرەت دەبێتە کالاێ مەسلەتی لەجیاتی خوێنی پیاویك جاروایە چوار ئافرەت دراون ، هەر لەو ڕوانگەیەوە لە پۆلینی کۆمەلایەتی ئافرەت دەکەوێتە هەرە خوارەوە ، وەسفی تری سەرسورهینەر دەکرێ ،بۆنمونە لە کتیبی (مسبوك الذهب فی فضل العرب- امام بن یوسف الحنبلی) دەلێ چۆن ڕەگەزی عەرەب لای خودا فەزلی زیاترە لە عەجەم ئاواش فەزلی پیاو لای خودازیاترە لە ئافرەت .

هەرچی کۆمەلگەی عەقلانیە ئەوا ئەو هاوکیشانە دەگۆڕێن عەقل و دەستکەوتە عەقلیەکان جێی ماسولکەو بازوو دەگرنەوە ، کۆتایی بەوە دێت لە پرۆسەیەکی سیکسی پیویست نێر بە براوەوسەربەرز ومێیەش بە دۆڕاو و تاوان بارو سەر شۆڕ دەرکەوێ ، بە واتایەکی تر لەشەڕی شمشێر ئافرەت کەوتوە لەشەڕی ئەلکترۆنیش ئافرەت وەك پیاوە ، ئەو دوو فاکتەرە ئەوەندە بە هێز بووینە هەر کاتێ چرای ئاینێك دەرکەوتوو بێت ئەوا عەقلانیش لەگەلی گەشایتەوەو ئافرەتیش ڕۆلی پەیدا کردوە، لەگەل کەم ترین لادان ئەو دۆخە وەك خۆی لێهاتۆتەوە ،مافی ئافرەت بزر بوویتەوە ،تا کۆمەلگە گەشە بکا زیاتر ئەو مافە بەرجەستە ، بە دیویکی تر تا فاکتەرە ئاسۆییەکانی  زیاترکاریگەر لەسەر مرۆڤ بیت لە جیاتی فاکتەرە ستونیەکان ئەوا ئافرەت زیاتر بەرەو مافی بەرێ دەکەوێ ، پیچەوانەشی بە پیچەوانە، کەواتە یەکێ لە (پارادۆکسەکانی خودیئافرەت) ئەوەیە کاتێ لایەنگری ئایدیۆلۆجیای ناشیۆنالیزمی دەکەن ئەوە لە هەمان کات گۆڕ هەلکەندنە بۆ خۆی ، چونکە بنەمای ناشیۆنالیزمی (نیرینەییە) هەروەك لە عەشیرەت وخیل وبنەمالەو باقی چەمکە ستونیەکان پشت (ئەگناتی) حیسابی بۆ دەکرێ نەك زگ (کۆگناتی) ، واتە نیرینە نەك مێینە، هەرچەندە ئەو رێسا کۆمەلایەتیە دژ بە ئاینیشە کە (هەردوولا نیرومێ بەشدارن)و لە هەلدانی ناسنامە زیاتربە دایك ناوزەد دەکرێ ، تەنها ح مسیح بە (ابن مریم)ناوزەد کراوە ،کەچی نەریت وکەلتوری کۆمەلایەتی زال بوە تا ئیستاش .

<u>**واقعی نەرێنی ئافرەت لەمێژوودا:**</u> لە کۆنەوە هەر کاتیك قۆناغیکی ڕووناکی هاتبیت باری ئافرەت چاك بوە ،جا ئەو رووناکیە چ بە هۆی ئاینی بیت یان تەقەلای عەقلی دروست بووبێت ، ئەگینا لە پانتایی میژوو باری ئافرەت خراپ بوە مادام نەریت وفاکتەرە ستونیەکانی تر کاریگەر بووبن ، جاریش وایە نەریت وکەلتور ئەوەندە بەهیز بووینە ئاینیشیان گۆڕیوە بە ئاڕستەی خۆیان ، تەنانەت لەو سەردەمەی جاڕدانی مافی ئافرەت لە ئەوروپا وێچووی مافی مرۆڤ بووە ، ئافرەت لە روانگەی (تەورات و ئینجیل)ی ئیستا بە تاوان بار هەژماردەکرێن ،هەروەك لەبەشیکی فقهی ئیسلامیش تاوزان بارە ،لە تەوراتی ئیستا ئافرەت تاوان بارو هەلخەلەتێنەری ئادەم بوە، واباس لە حەوا دەکات : امرأة ماكرة، عاصية لأوامر ربها، تنقاد للشيطان المتمثل في صورة الأفعى الحية. وتخدع الرجل آدم،

وتغريه بأكل الثمرة، وعصيان أوامر ربه، فيعصاه[563]. لەگەل زۆربەی ئافرەتە ناودارەكان ئاوا بە خراپی باسیان دەكا ،: عەرەب لە نەوەی ئیسماعیلن كە دایكیان هاجەرە كەنیزە بوە كەچی یەهودیەكان لە سارانە كە ئازاد بوە نەك كەنیزەیە ، لە شوێنیكی تر (فقال أبرام لساراي: هو ذا جاريتك في يدك، أفعلي بها ما يحسن في عينيك، فأذلتها ساراي، فهربت من وجهها- تكوين 6/16) ، لە تیلمۆد دەڵێ جگە لە ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل ئەوانی تر ئاژەلن ،ئاژەلیش مارەیی ناوێت ونەی بوە ، فەزلی ئافرەتی جوو ،فەزلی ئافرەتانی قورەیش..یەك تێڕوانینە.

لە ئینجیلی ئیستا تاوانی دەرپەڕاندنی مرۆڤ لە بەهەشت دەخەنە ئەستۆی ئافرەت( لأَنَّ آدَمَ جُبِلَ أَوَّلاً ثُمَّ حَوَّاءُ،وَآدَمُ لَمْ يُغْوَ لَكِنَّ الْمَرْأَةَ أُغْوِيَتْ فَحَصَلَتْ فِي التَّعَدِّي[564]، زۆر بە ڕاشكاوانەتر هۆی سەردەستەیی پیاو بەسەر ئافرەت بەو ئایەتانە گوزارش دەكا: **قال بولس في رسالته الأولى إلى كورنثوس ﴿ 11 : 3 _ 9 ﴾ : وَلَكِنْ أُرِيدُ أَنْ تَعْلَمُوا أَنَّ رَأْسَ كُلِّ رَجُلٍ هُوَ الْمَسِيحُ. وَأَمَّا رَأْسُ الْمَرْأَةِ فَهُوَ الرَّجُلُ. وَرَأْسُ الْمَسِيحِ هُوَ اللهُ .... الرَّجُلَ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُغَطِّيَ رَأْسَهُ لِكَوْنِه صُورَةَ اللهِ وَمَجْدَهُ. وَأَمَّا الْمَرْأَةُ فَهِيَ مَجْدُ الرَّجُلِ. لأَنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ مِنَ الْمَرْأَةِ بَلِ الْمَرْأَةُ مِنَ الرَّجُلِ. وَلأَنَّ الرَّجُلَ لَمْ يُخْلَقْ مِنْ أَجْلِ الْمَرْأَةِ بَلِ الْمَرْأَةُ مِنْ أَجْلِ الرَّجُلِ ...** لەهەموشیان یەكەم جەنگی بەشەری (ئەو جەنگە كەلەنێوان قابیل وهابیل دروست بوو ) دەخەنە ئەستۆی ئافرەت ، لە ئەفسانەی كۆنی ئەگریكیش واهاتوە شەڕو جەنگلەلایەن خواوە لە ناو سندوقێك شاردرابۆوە كەچی ئافرەتێك بە ناوی (باندۆرا-گوایە یەكەم ژنی سەر زەوی) دەرگای سندوقەكەی كردەوەو جیهان ومرۆڤایەتیان كردە شەڕانی وتوندو تیژی[565] ، سوكرات مەكری ژنانی بەستۆتەوە بە شەیتان ،دەڵێ ئافرەت داری ژەهرە كەمی بخۆ ئەگینا دەتكوژی ،ووتویەتیشی وەك دارواية بەرو درکی هەیە[566].

---

[563] كتاب المقدس–العهد القديم (تكوين 1/3–6)

[564] ئینجیل1تیموثاوس 2 : 12 _ 14

[565] موسوعة العربية العالمية –المادة:اساطير هەروەها بڕوانە : موسوعة مصطلحات النقدية ج1ص512.

[566] ابن ابى اصيبعة – عين الانباء فى طبقات الاطباء ص52-53 .

ئەو تێڕوانینانە ڕەنگی دابۆوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست تا سەدەی ڕابووردوو هەلوێستیان بەرامبەر ئافرەت سەلبی بوە ،ئەدینوس دەلێت:( المرأة . . هي العمل الوحيد غير الكامل . . الذي ترك الله أمر إتمامه للرجل)، هەروەها تومائەکوینی بەو ڕووکارە دەلێت:( المرأة إنسان ناقص التكوين. .وكائن عرضي )[567] لەبەریتانیاش به بیانۆی پیسی وفیلبازیان فەرمان لە هنری پێنجەم دەرچوو تیایدا له ئافەرەت قەدەغە کرابوو (کتێبی پیرۆز )بخوێنن،مولکیشیان بەناو نەدەبوو تا سالی 1882.

هاوتەریب لە سەردەمی ئەگریك ویۆنانی کۆن یاساکانیان لە قازانجی ئافرەتان نەبوو ، بێ بەش کرابوون لەمیرات و عیبادەت ،بەلاٚم بۆ ئافرەتە خزمەتکارەکان(کەنیزەکان) دەکراگۆرانی ودانس وهونەری تر بکەن[567] ، ئەسل لەو سەردەمی لەزۆربەی شارستانیەکانی چینی وهندی و(عەجەمیش تا ڕادەیەك) میسری و بابلی ئافرەت بەلا بوە نەك قەلا وەك دوای لە ئاین واوەسفی کرا ،ئافرەت لە زۆربەی چیرۆك وبەسەرهات وئەفسانەکان مەکربازو فیلاوی و هەلخەلەتێنەرو دەستی شەیتان بوە ، لە ئسەردەمی ئەگریکی فۆلکلۆریکیان هەبوو گوایە جاران شەڕ لەناو سندوقێك کلیل درابوو، یەکەم جار ئافرەتێك چوە ئەو سندوقەی کردۆتەوەو شەڕ هاتۆتە دەر ولەوکاتەوە شەڕکەوتۆتە ناوخەلك ، ناویان لەو ئافرەتە نا (باندۆرا)[568]، هەمو ئەوانەو تێڕوانینە ئاینیەکانیش بەو جۆرە دیمەنیکی ئافرەتی ناشرین پیشان دابوو ،لەلایەك ژیان بێئافرەت ئەستەم بوو لەلایەکیش دۆخیان ئاوابوو ،بۆیە کەسێتی دەکەوتە چوارچێوەی خیزانی وبەزەیی نەك مافی یاسایی ، بە ئادەمیزادی تەواوهەژمار نەکراوە له دەنگ و رەنگ و ماف و ... هەتا کێشە لەسەر ئەوە بووە ئاخۆ لە رۆژی دوایی دادگایی دەکرێ یان وەك بەستەزمانێك هیچی لەسەر نیە، بەو ڕوانینە میژووییە کۆمەلیك قسەی نەستەق وپەندیان لەسەر دروست بوە ،هەندیکی لیهەلدەبژیرین : ( ئافرەت پرچی درێژە بەلاٚم عەقلّی کورتە -چوویە لای ئافرەت قامچیت بیر نەچێت - زمانی ئافرەت لە درك تیژ ترە- ئافرەت لە یەك کاتدا 77ڕای هەیە -..) .

---

[567] له ل151ی جمهوریه افلاتون باسی ئەو رۆلەی ئافرەت دەکا .

[568] موسوعة العربية العالمية –المادة:اساطير

له میسر سالآنه جوانترین کچ پێشکەشی ڕووباری نیل دەکرا[569]، له چین وهند بارو دۆخیان زۆر خراپ بوه ، تا ئەو ڕادەیه دەبوایه ئافرەتی هندی لەگەل مردنی مێردەکەی پێکەوه بسوتابوونایه ئەگینا وەك نەریتی عەرەب سەرشۆڕی بوو[570].

له جیهانی ئیسلامی به شێوەیەکی تر بوو ، ئافرەت له قورئان وپەیام ئادەمیزادێکی تەواو بوه بەلام کەدەهاته ئاستی فقه(بەتایبەتی ئەو فقهانەی کاریگەربوه به بەهای ئەعرابی و بەهای بەدەوی ) ئەوه به ئادەمیزادیکی ناتەواو پاشکۆ حیسابی بۆکراوه ، ئافرەت به فتنەو **حبل الشیطان** و..وەسف کراوه، بەشیکی زۆری فقهیش لەو تیڕوانینه چەوته بەرپرسیاره (نەك دەقی ئاینی) ،له کاتیکا له قورئان ئافرەت به (زینه)وەسف دەکاوله فەرموده (به نیوەی ئیمان) کەچی فقه دەلێ فتنەیه ، له فەرموده ئافرەت (شقائق الرجال) له فقه دەلێ مولکی پیاوه ، له پەیاما بەهەشت له ژێر پێی ئافرەته کەچی له فقهازۆربەی خەلکی جهنم ئافرەتن، له قورئان دەلێ هاوسەری خۆشەویستی وتەباییه کەچی فقه دەلێ زال بوون وسەرداریه(نزیکه له فکری مارکسی که دەلێ هاوسەری پیکهاتوه لەدوو جەمسەری ناکۆکی)،له قورئان دەلی (بعضهم اولیاء البعض)له فقه دەلێ عەبدەو عەقلی نوقستانه و(سەفیهە-ساویلکەیه)و زەعیفەیه ، به خزمەتکار وەسفکراوه ونابێت به ئافرەت بلێی سەیدە[571]، له فقه دەلێت ئافرەت عەورەته له قورئان سورەتیك بەناوی ئافرەتەوەدەلێ(هن لباس لکم وانتم لباس لهن)...،زیاتر لەوەش بۆ ئافرەتانی کەنیزه هەر کارەساته ،تەنانەت فتوای جیاش بۆ ئافرەتی (حره)و ئافرەتی (جاریه)دراوه، کار گەیشتۆته ئەو هەلویسته زۆر نامۆیه: «**يغسل من بول الجارية، ويرش من بول الغلام**» [572].فإن العلماء حاولوا التماس حكمة في سبب التفريق بين بول الجارية وبول الغلام

---

[569] بۆدرێژەی ئەو نەریته بڕوانه :سینۆهه دکتۆری فیرعەون به درێژی ئەو بابەتی تێدایه .

[570] بۆ ئەو سەربردانەی ئافرەتانی هند بڕوانه (ابن بطوطة-نزهه المشتاق ..چەندین ڕووداوی بەچاوی خۆی بینیوەو تۆماری کردوه .

[571] بۆ ئەو جۆره تێڕوانینانه لەلایەن زۆربەی فەقیهەکان هاتوه بەلام ووردتر سەرنج بده : شیخ الاسلام ابن التیمیه- **مجموع** الفتاوی ج34ص313 ،ج25ص314،ج29ص100 .

(572) أخرجه: أحمد (المسند) 76/1 ، 97 ، 137، وأبو داود رقم 387 ، 389، والنسائي برقم (304)، والترمذي برقم (610) وحسنه، وابن ماجة رقم (528)، 531 – 533، وغيرهم.
وصححه الحافظ في (التلخيص) 28/1، ونقل عن البخاري والدارقطني تصحيحه، وكذا صححه: أحمد شاكر في تعليقه على (المسند) رقم (563)، والألباني في (الإرواء) رقم 166.

من حيث التطهير، من ذلك ما ذكره أبو اليمان المصري رحمه الله حيث قال: سألت الشافعي عن هذا الحديث، فقال: لأن بول الغلام من الماء والطين وبول الجارية من اللحم والدم، ثم قال: لي: فهمت؟ قلت: لا، فقال: إن الله تعالى لما خلق آدم خلقت حواء من ضلعه القصير، فصار بول الغلام من الماء والطين، وصار بول الجارية من اللحم والدم، قال لي: فهمت؟ قلت: نعم، قال: نفعك الله به [573].،ئەوە لە بنچینەدا لە ئیسلام نەهاتوە بەلکو لەسەردەمی یۆنانی کۆن بۆ ئافرەتە خزمەتکارەکان(کەنیزەکان) دەکراگۆرانی ودانس وهونەری تر بکەن[574]،(ئەسلی جیاوازی حورەو جاریە)لێرە دێت نەك لە ئەسلی ئاین..، بەگشتی وەسفی ئافرەت لە مەزهەبەکانی سونەو شیعە بە خراپی هاتوە ، جاروایە شیعە ئافرەتی بەشەیتان ودوژمنی خوا وەسف کردوە[575] ، وەسفی شەیتان بۆ ئافرەت یەکەم جار لەلای ئەگریکیەکان هاتوە ، لەلای سونەش ئافرەت بە فتنە ومەکربازی ودۆزەخی ...،ئەو وەسفانەی شەیتان وفتنە زیاتر لەوە دێت گوایە دەبنە هۆی ئەوەی سەرنجی پیاوان ڕاکیشن بۆ کاری خراپ! ئاوا نیەئایا خودا شەیتانو فتنە دروست دەکا،کاری هەلەی کردوە،نەخێر، ئەوە ئافرەت نیە شەیتان وفتنەیە بەلکو ئارەزووبازی پیاوە دەبێتە فتنەو شەیتان ،ئەگینا جوانی ئافرەت دروست کراوی خواییە نەك گوزارشی ئافرەت خۆی ،مەیلی مێ بەلای نێر و مەیلی نێر بەلای مێ ڕێسایەکی گەردوونی وخواییە ، تاوان نیە بۆ ئافرەت .

<u>**واقعی ئەرێنیەکەی**</u> شان بەشانی واقعە نەرێنیەکە واقعی ئەرێنیش هەبوە ،بەزۆری واقعە ئەرێنیەکە بە کاریگەریەکی ئاینی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بوە،لە ئەفسانەکان واهاتوە هەندی خواوەندی پاریزەری مافی ئافرەت لەکۆنەوە هەبوە وەك(باست)کە خۆی یەك لەو خوایە دەگمەنانە بوە کە ئافرەت بوە ، لە فالیسیت دیسان خواوەندیکی ئافرەتە خۆشی وتەندروستی بۆ جیهان هیناوە[576]، زۆر

---

[573] سنن ابن ماجة ج1ص262 - .أخرجه ابن القطان في زوائده على ابن ماجة رقم 37.
[574] له ل151ی جمهوریه افلاتون باسی ئەو ڕۆلەی ئافرەت دەکا .
[575] بۆ ئەو جۆرە فتوایانە بڕوانە: لاهوت السياسه ص42 .

[576] قاموس الخرافات والاساطيرص67 ص140

دۆخی تری واهەیە گوزارشە لەوەی کە ئافرەت تاپلەی خوایی بوونی هەبوە ، ئەوە جیایە لەگەل هەندێ تیۆری دایکسالاری گوایە سەردەمانێك ئافرەت پەرستراوە ..ئەوە زۆر ئەسلی نیە .

لە مێژودا یەکەم جار لە ناوچەکانی ئەوەی ئیستا پێی دەوترێ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست هەندێ یاسا بە ناوی (شەریعەتی ئۆرنامۆ) هاتوە ، تیایداقەدەغەی سێکسی بە زۆری ودابەشی ژن بە میرات کراوە ،دوای شەریعەتی ئۆشنۆیا هەندێ چاکسازی تری کردوە ،دوای شەریعەتی (لبت عشتار)مافی ئافرەتی نەخۆش و پەك کەوتەو کچی بێ مێردی دیاری کرد ،لە یاساکانی حمورابیش لە کۆی 282مادەی یاسایی 92 مادەی سەبارەت بە ئافرەت بوو ، کە تیایدا بۆ یەکەم جار ئافرەت توانی کڕین وفرۆشتن و مولکیەت ومیرات وزۆری تر بە دەست بهێنی ،لە سەردەمی ئەگریك ویۆنانی کۆن یاساکانیان لە قازانجی ئافرەتان نەبوو ، بێ بەش کرابوون لەمیرات و عیبادەت ، ئافرەتیش لەگەل چینەکانی غەوارەوبەندە و هەژاران بە هاوولاتی یۆنانی هەژمار نەدەکرا ، لە کۆماری ئەفلاتون[577] و ئەرستۆش لە کتێبەکەی (رسالە فی السیاسە)دەلێ سروشت هێزی بە مێشك وعەقلی ئافرەت نەبەخشیوە بۆیە تەنها بۆ ناو مال دەگونجێن ، سوکراتیش ئافرەت بە سەرچاوەی کێشەو قەیران پۆلین دەکاو دەلێ : ئافرەت ئەو درەختەیە گەلاکانی سەرنج ڕاکێشن بەلام بەرەکەی ژاراویە ،دەلێ نوقستانیشە لە خوار مرۆڤە هەرە باشەکەیان لە ئاستی بەندەدایە.

لەناوچەکانی ئیسپارتەی یۆنان بارودۆخیان باشتر بوو[578] ،لە سەردەمی ڕۆمانی لەچاو پێشوو زۆر باش بوو ، تا ڕادەی بەشداری لە دەسەلات و کۆکردنەوەی سامان و بوون بە قازی ، بەلام بە (شەیتانی دل)یش وەسف دەکرا ،لە سەردەمی فیرعەونەکانیش بارودۆخیان لە هاوتاکانیان چاکتر بوە ، چەندین ئافرەتی ناوداریان لێ پەیدا بوە، لەوانە زولەیخا[579] و شاژن حاتشبسوت20 سال جلەوی دەسەلاتی میسری لەدەست بوو ،هەروەها دەسەلاتی ئافرەتانی تری وەك اخناتون نفرتیتی—جوانی جوانان هاوسەرەڕەشەکەی امنحوتب(تی)وکیلوبترا.

---

[577] لە جمهوریە افلاتون لە (ل148 تا156) وەسفی ئافرەت بە شێوەی جیا جیا دەکا .

[578] جمهوریە افلاتون باس لەئیسپارتەو کریت بە چاکتر دەکا .

[579] لە قورئان –سورەتی یوسف باسی دەکا .

له ئاینی زەردەشتی له چاو ئەوانه پایەی ئافرەت زۆر باش بوە ،بۆیه له چوارچێوەی دەسەلاْت گرتنه دەستی ئافرەتان دوو کچی کیسرای دوەم(شەهرباراز وسەباهبود) ناویان له مێژوو دێت[580]، له هەندێ مەوسوعەی گەورەی بریتانی هاتوەو دەلێت بەو هۆیەوە ئافرەتانی کورد له مێژوودا ئاوا ڕۆلی بە هێزیان هەبوە[581] ،له گەڕیدە دەرەکیەکانیش ئەو ڕاستیە بەرجەسته بوە ،(کلۆدیس ریچ)دەلێ ئافرەتی کورد له چاو ئافرەتانی تورك وعەرەب و ئێرانیش زۆر باشتر بوەو جۆرە یەکسانی وسەربەخۆیی ودەسەلاتیان هەبوە[582]،خاوەن مولکی تایبەتی خۆیان بووینه بەناوی (شکارەت)[583]له بادینی ولەسۆرانی بەناوی شکارته ،هەریەکه له ئیبن روشدو دوایش فۆرێ دەلێن پێگەی هەر کۆمەلگەیەك به پێگەی ئافرەت دەپیورێ،لەلای کوردیش پێوانەیەکی تر دیاری کراوە بۆ پیشکەوتن ، له بلاْوکراوەی (مەشروتیەت) به پێنووسی (شەریف پاشا)ی کورد له (ژ:40ی سالْی 1903) نووسیویەتی: (ئەوەی دەیسەلمێنێ کورد پیشکەوتوو وئازاد بووینه ئەوەیه که ئافرەتانیان هەرگیز پەچه ناپۆشن) .

له ئاینه ڕاستەقینەکان باری ئافرەت له مسیحی ویەهودی وئیسلام باش بوە، تەنانەت ح مسیح جاروایه به یەکەم داکۆکیکەری ئافرەت هەژمار دەکرێ وەك له کتێبی پیرۆز هاتوە: «لَيْسَ جَيِّدًا أَنْ يَكُونَ آدَمُ وَحْدَهُ، فَأَصْنَعَ لَهُ مُعِينًا نَظِيرَهُ»تکوین 2: 18، ڕێزی ح مریەمیش بەلگەی ترە، بەلاْم دوای دەستکاری کردنی کتێبە ئاسمانیەکان فتوای توندیان له دژ دراوە [584]، له قورئانی پیرۆز پیغمبەرەکان بەدەگمەن بەناوی باوکیان نەهاتون،کەچی ناوی (مسیح ابن مریم)چەندین جار هاتوە ،له قورئاندا ناوی (رجل-پیاو) و(مرأە-ئافرەت)وەك یەك هاتون هەریەکه 24 جار هاتون ، له کەلتوری ئیسلامی به هەردوو دیو تەماشای ئافرەت کراوە ،هەرچەنده فقهی

---

[580] ایران- تاریخ والحضارة ص32

[581] بۆ درێژەی ئەو باسانه بڕوانه : (الموسوعه الحره ) ماده :حقوق المرأه .

[582] کلودیس-رحلة فی العراق سنة1880ص104 .

[583] بۆ ئەسلی زاراوەی شکارەت بروانه :عادات ورسوماتی اکرادیه —وەرگیربۆ روسی: روو دینگۆ ،له روسیەوە بۆکوردی :د شکریه رسول ل78 .

[584] بۆ دلْنیا بوون له دەستکاری کتێبی پیرۆز پێش ئەوەی بڕوانیه (ملل والنحل)ی ابن حزم و(ابن تیمیه ) کتێبی (رساله فی السیاسه واللاهوت)ی سپینۆزا بخوێنەوە،یان کتێبەکەی هۆبز(لفیاثان) بخوینەوە .

ئیسلامی پیش ئەوروپا ئەو پانتاییە مافەی قەناعەتی پێ هەیە بۆ ئافرەتی دیاری کرد،بەلام زۆر بە ئاشکرا سەلبیاتی نەریتی کۆمەلایەتی بە فقهەوە دیارە ،بۆیە پایەی ئافرەت لە قورئان ولە فقهدا زۆر لێك جیایە ، هەندێ جار وەك یەهودی ومسیحی بە کەم عەقل ومنال و (سفیه)لە قەلەم دراوە ، کار گەیشتە ئەو ڕادەیە وەك چۆن لە تیلمۆد دەلێ ئافرەتی (غەیرە جوو- ئومەمی یان جویم-اغیار) مارەیی ناوێ ئاواش لە هەندێ بەشی فقهی بۆ هەندێ ئافرەت(لەوانە کەنیزەکان) ووتویانە مارەیی پیویست نیە ، خراپی هەلوێستی فقهی ئیسلامی بەرامبەر ئافرەت بەبەراوردبە پەیامی خوایی بوە ئەگینا لەچاو ئەوروپاو هندوچین ومیسرو نەفامیەکانی تری ناوچەکە زۆر پیشکەوتوو بوو ، ئینجا هەمو فقه ئەو هەلویستە خراپەیان نەبوو ،فقهی زانایانی ئەهلی فکرمیانڕەوانە تر بوە، لە مەزهەبی حەنەفی زۆر جیایە ئافرەتی پیگەیشتوو دەتوانێ خۆی چارەنوسی خۆی دیاری بکات بێپیویستی ئینتداب، جاریش وایە شاهیدی دانی وەك پیاو بوە ،ئەوانە کاریگەریەکی زۆریان بەسەر ئەوروپاش هەبوە ، بەو شێوەیە تێڕوانینی ئەوروپا بەرامبەر ئافرەت بەرەو چاکی ڕۆیشت ، بەرەبەرە ئەو دۆخانەی ئەوروپا چارە کرا لە دوای تێکەلّ بوونی شارستانی رۆژئاوا بە شارستانی ئیسلامی لە رێگەی ئەندەلوس ،جاریشوابوو لە ڕێگەی ئیتالیاوە .

چارە لە مەدرەسەکان

لەو سەردەمە زۆر باسی کیشەی ئافرەت دەکرێت ،ئەوە سەروەریەکی رۆژئاوایە ئەگینا کەلتوری عربی زۆر دوورە لەو مافە ،سەرەڕای ئەوەش هەردوو مەدرەسەی لیبرالی وسۆشیالیستی وبەشی زۆری نوسەرومەدرسە فیکری و رێبازە سیاسیەکان کیشەی ئافرەت بەکیشەیەکی سەربەخۆ دەزانن بە جیا لە گیرو گرفتەکانی کۆمەلایەتی , هەروەها جیاوازی نێوان پیاوو ئافرەت دەگێرنەوە تەنها بۆهەل و مەرجە کۆمەلایەتیەکان، بۆیە چارەسەرەکانیان بەزۆری بەبڕیارو چەسپاندنی ئەو یەکسانیە یە ، بەو شێوە لەنگی لە چۆنیەتی تەرحکردنەکە بوویتە هۆی خواستەکانی مافی ئافرەت بەلێلی بمێنێتەوە کەچیان گەرەگە ، ئیحتجاجەکەیان دژ بەکێ یە ، دژ بە:مێردەکانیانە ، بە ئاینە بە نەریتی میللەتەکەیە بە یاساو دەستوری وولاتەکەیە ...دیار نیە چی دەوێ .

له چارەسەریشدا داوای یەکسانی ئافرەت و پیاو کردنە لەهەموو بوارەکانی زیندەگی و کۆمەلایەتی و مەدەنی کە رزگار بوون ئافرەتی تیا دەدۆزنەوە، وەك لە کۆنگرەی سیداو و بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتوەکانیش بەو ئاڕستە هاتوە ،بە هەڵە زاراوەی (جندەر) و(دایك سالاری)بەکاردەهێنن. بەلام بەزوریش ئەورێگا چارەیان روون نەکردۆتەوە (بیجگە لە مارکیسزم ) چۆن ئەو یەکسانیە دێتە دی..! هیچ نمونەیەکی واقعی لەمیژووشدا نیە کە ئافرەت و پیاو لەومەجالانە بەیەکسانی بۆساتیك دیترابن ، هەرچەندە لەرووی تیوری (کەبێ مەسئولیەت ترە ) هەر نەتوانراوە موزاعەفاتە کۆمەلاتیەکانی ئەو یەکسانیە چارەسەر بکەن، بیجگە لەوەی رەگی ئەو نایە کسانیە هەر لەهۆکارە کۆمەلایەتیەکان نیە، بەلکو قولترن بۆناو ڕووە فسیولوجی و بایولوجی  هەتا کیمیای و فیزیایش شۆڕدەبێتەوە، .... جا نازانین ئەو یەکسانیە چۆن بە خەباتی سیاسی دێتە دی ، ئەوە پیویستی بەدەست کاری کردنی یاساکانی سروشت و هەندیکی گەردوونیش هەیە، بەلام باجارێ هەر لەچوار چیوەی کۆمەل بمێنین و دەقاو دەق بێینە سەرخیزان کەشانەیەکی زیندووی کۆمەلایەتیە ، مادام لەچارەسەریەکان دا خیزان بمێنێت (چونکە لەچارەسەری مارکیسزم دا خێزان نامێنێت )، ئایا دەشێت دوو سەرکردەی خێزان هەبێت ، سەرنج بدەن چ لەسروشت چ لەژیاندا چ لەکۆمەلدا هیچ سیستەمێك هەیە دووسەرکردە دوو بەڕێوەبەر و دووشێوە ڕێنمایی ... هەبێت ، سیستەمی بوونەوەر هەر هەمووی پێکهاتووە بەشێوەی (هەرەمی) و ناوەندی ، لەچ وولاتێك دووسەرۆك کۆمار هەیە ،نمونەی نوێوشاز لە ئۆرگوای لە نێوان (1911 تا1915) 9کەس پێکەوە سەرۆك بوون[585] ،تا ئیستاش ئیش وکارەکانیان وەك نوکتەی سیاسی ویاسایی باس دەکرێ ،لەو وولاّتە پان وبەرینە نەگونجێ ئەی چۆن لەناو خێزاندا دووسەرۆك دەگونجێت ، هەردەبێت یەکیان بن و ئەو کاتیش ئەو یەکسانیەو هاوسەنگیە تیك دەچێتەوە مادام یەکیان فەرمان رەوا یەکیان فەرمان وەرگر بیت ،مەرجیش نیە یەکسانی مانای دادگەری بێت ،لێرە یەکسانی کردنیان ستەمی لێدروست دەبێت،هەر ناشبێت، کەواتە ئەو یەکسانیەی ئافرەت و پیاو لەژێر سیستەمی کۆمەلەیەکی خیزان مەحالە، وەك مەحالەکانی ناو سروشت (وەك هایزنبرگ و ئەخیل و سولەحفات..مەحال ئەوەندە زۆرە ناژمیردرێت) ، بۆیە مارکیسزم لەچوار چیوەی (سیستەمی

---

[585] بڕوانە : مەوسوعەی جودی ل111 .

خیزان ) دا ئەو یەکسانیەی پێ نەدۆزرایەوە ، بریاری هەلوەشانەوەی خیزانی داوە ،لە سەرمایەداریش چارەیان ئەوە بوو هەرکەسێ لەخۆی بەرپرسیار بیت وفلسەفەی (individual) لەوە سەری هەڵدا،لە ڕاستیدا بیرو ڕای وزاناو فەلسەفەومەدرەسەکان تریش لەبارەی ئافرەت یان زۆر سەرەڕۆو سادەیە یان ئەوەتاکەقوول بوویتەوەحەتمەن بەجۆرێك چۆتەوە سەر ڕیشالەکانی مارکسیزم لەو بارەیەوە ،بۆیە لەبارەی توێژینەوە لە کێشەی ئافرەت هەلوەستەی هەرە گەورە لە سەر مارکسی دەکرێت ، بەو شیوەیە لەمارکیسزمدا دەچینە نێو ڕاو بۆچوونی مدرسە فیکریەکان بۆ ئەو مەسە لەیە .

<u>چارەی کێشەی ئافرەت لە مدرەسەی مارکسیزمدا:</u> مارکسیەت چارەی هەمو کیشەیەك لە ڕوانگەی ئابووریەوە دەدا، لەو دەروازەدا دەچینە ناو پرسی ئافرەت لەروانگەی پەیوەندیەکانی ئابوری کەرەنگ دانەوەکەی سەرخانی بریتیە لە (ناکۆکی چینایەتی ) ،بۆ ئەو پرسەش هەلویستی مارکیسزم لە لایەن ئەنجلس لە کتێبی (اصل العائله والملکیه الخاصه والدوله)[586] دا ڕوون کراوەتەوە ، کەپشتی بە کتێبی(المجتمع القدیم -لویس مۆرگان1866-1945 )[587]بەستبوو ،لەو کتێبانە بۆچونەکانی مارکسیەتی بە ڕوونیدا تیادا گوزارش کراوە کە لە میژوودا چۆن مافی ئافرەت کەووتووە.

مارکسیزم وا سەیری باری ئافرەت دەکا لەو مێژوەی سەروو کە ئەوە بارو دۆخی ئابووری و ئاستی ململانێی چینایەتی وای لە ئافرەت کردوە ،بۆیە چارەسەری کیشەکانی بەستۆتەوە بە چارەی کیشەی چینایەتی ، دژبەوچارسەری و تیۆرانەشە کەلەچوارچێوەی سەرمایەداری باویان هەبوو ، لەوانەش ( لیبرال دیموکرات ، سوسیال دیموکراتی و..) لەهەموان زیاتر پرسی مولکیەت و پرسی ئافرەتانە بەتایبەتی ، جا نەك هەر لەرووی واقیعدا بەلکو لەرووی تیوریشەوە ، وەبە چارەسەری کاتی وهەلخەلتێنەری هەژمار کردوە ، بەتایبەتی ئەو سەربەستیە بۆ ئافرەت لەژێر سایەی دیموکراتی سەرمایەداری هاتووەبەلەبیر بردنی کیشەئەسلیەکەی لەقەلەم داوە، پێیان وایە ئەوە زیاتر بارگرانیە بۆ

---

[586]ئەو کتیبەش هەر مسوەدەی کارل مارکس بوو دوای ئەنجلس تەواوی کرد ،چەند کتێبێکی تریش هەیە لەوانە: العائله المقدسه-مارکس،علاقه المراه بالرجل ...هتد

[587]ئەنجلس ومارکس زۆر بەو کتێبەی مۆرگان کاریگەرن ، وەسفی بە ئاستی (اصل انواع)ی داروین دەکەن ،یەکەمیان لە زانستی کۆمەڵایەتی ودوەمیان لە زانستی بایۆلۆجی .

ئافرەتان کەچەوسانەوەی چینایەتیشی دێتە سەر، مارکس لە کتیبی( العلاقة بين رجل والمراة ) دەلیت لە کۆمەلگەی برجوازیدا خێزانداری لە پێناو بەرهەمە، ئافرەتەکەش ئەو ئامرازەیە، بۆیە مارکسیزم هەر وەك لەسەرووش دەرکەوت وای بۆ چووە کەئافرەت لەئەنجامی پرۆسەی ئابووری قوول کیشەکەی پەیدا بووە، بریتی یە لەکردارێکی میژوویی ئالۆز، بەبریاریك یان بەتۆمارکردنی یەکسانی لە (پەیرەوی حزبێك ) یان لەدەستوری وولاتێك یان دروست کردنی (یەکیتی ئافرەتانیك ) یان هەر ریکخراویکی پیشەیی بۆیان ئەو پرسەچارەسەر نابیت ، هەربۆیە کیشەکەی بەکۆمەلێ کێشەی مێژووی بەستەوەو تا رزگاری کۆمەلێکی چیندار بۆ بێ چین (کەلەشوعیەت دا دێتە دی) ئەو کێشەیە چارەسەر نابیت ،... جابابزانین چۆن بەدروستی چارەسەر دەبیت؟ دووبارە دەگەڕێتەوە سەر سەرچاوەی پرسەکە ،مادام لەگەل پەیدابوونی خیزان و دابەشکردنی کار لەنیوان پیاو ئافرەت کەئەوانەش لەئەنجامی پەیدابوونی مولکیەتەوە دەردەکەوتن ،ئەوا دەبیت ئەو دەزگایە هەلوشینیتەوە ، بۆ ئەوەی دابەش کردنی کار نەمینیت، بۆیە لەشوعیەت دا هەروەك مولکیەت نامینی – دەولەت نامینی – یاسا نامینی ..خیزانیش نامێنی ، لەوەلامی مان و نەمانی خیزان لەشوعیەتدا ئەنجلس دەلی (... هەرچیەکی بنیاد نراوی سەر مولکیەت بیت نامینیت )[588] ،هەرکەسی چ ئافرەت چ پیاو بەو پرانسیپەدەژی( بەپێی توانا ئیش و بەپی پیویست وەرگرتن )، ئیدی کەس پیویستی بە بەرپرسیاریەتی کەس نابیت و کۆمەلگایەکی هیمن و مسۆگەر دێتەدی ، ئەو پیویستیانەی مولکیەت و خیزان و دابەش کردنی کارو یەکگرتنی ژن و پیاو نامینیت ! وەك دەلین (بەهەشتیکی سەرزەمین) لەرووی خاسیەتە بنچینەیەکان دەگرێتەوە لەهەموو روویەکەوە، ئافرەتیش دەبنەوە ئادەمیزادی تەواو، دایك سەربەخۆ دەبی و منالەکانیان سەربەخۆ دەبی و منالەکانیان بەناو ئەوان دەکرێنەوە ،بە جۆریك لەجۆرەکان لیرەوە دینەوە سەر لایەکی چارەی (لیبرال دیموکراسی) کە تاکگەراییە ...لە ڕاستیدا لەناو مەسیحیەت و جاروایە لە هەندێ ئاینی تریش هاوسەری نەکردن وەك تەقواو دینداری جدی

---

[588]- انجلس- نصوص مختارة ص361 .

هەژمارکراوە ،راهبی لەوە هاتوە ،لە کۆنەوە مەزهەب و تاقمیك هەبوون بەناوی (ئەپۆستۆلیش) ئەوانە بوون کە هاوسەریان لە خۆ قەدەغە کردبوو لەبەر خاتری خودا[589] .

بەو شیوەیە پایەی ئافرەت دەگەرێتەوە شوینی سروشتی خۆی(دایك سالاری)، دوای ئەوەی بۆ یەك (سورە میژوویی) لەدەستی دابوو.

**ئافرەت لە ئایندا:** ئەو چارەسەریەی مارکسی زۆر قورسە تاڕادەی مەحال ,ناکرێ کۆمەلگە بەبێ سیستەم ودەولەت ویاساو کۆمەلگەو خیزان ، لەسەرمایەداری تاڕادەیەك کیشەی ئافرەتی چارە کردوە بەلام نەیتوانیوە دادگەری بهێنیتە دی بۆ ئافرەت ،لێرەوە پاساوی تر بۆگەڕان بەدوای چارەی دادگەرانە بۆ ئافرەت بەردەوام دەبێت .

هەموو لایەك دان بەوە دەنێن کە ئافرەت چەوساوەیە بە چەندین ڕووکارو ئاڕستەوە،بەشێکی بە ڕزگاری نیشتمانی چارە دەبێ ،بەشێکی تری بە ڕزگاری چینایەتی ،بەدامەزراندنی کۆمەلگەی مەدەنی بەشێکی تر چارە دەبێ ،بەشی تری بە پیادەی دادگەری و...هتد ،لەدوای هەمو ئەوانە بەشێك دەمێنێت تایبەت بە ئافرەت مادام هاوسەری بریتی بێت لە گواستنەوەو خستنە سەر میلاکی پیاو ،لێرەدا گرێبەستی مارەیی وپیادەی یاسای هەرەدادگەری ڕۆل دەبینی بەلام لەکۆتایدا لە چوارچێوەی خێزان ئەگەر ئەو پیاوە بە بیروباوەڕو ئاینێکی زۆر ستاندەر پەروەردە نەبووبێت ئەوا لایەنی شەڕانیەتی مرۆڤ لەو کەمە دەسەلاتەی(مێردایەتی) بەکاردەهێنێ، ئەوەیان کێشەیەك بوە لەو مێژوەی مرۆڤایەتی بە ئاینیەکانیشەوە فەترەی کەم ونمونەی دەگمەن نەبێ لێی جێ بە جێ نەکراوە.

لەلایەکی ترەوە مادام نەریتی کۆمەلگە وابێت ناموس[590] تەنها لای ئافرەت بێت ولەهەر ڕووداوێکی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ لەلایەن هەردوو ڕگەز ئەوا پیاو سەربەرزو براوە بێت وئافرەتیش دۆڕاو

---

[589] المعلم بطرس البستاني –كتاب دائرة المعارف –بيروت سنة الطبع 1816 ، ج1 ص311

[590] لە بنەچەدا ناموس مانای شریعەت ویاسا دەگریتەوە ، وا پیدەچی لە (نامـە)ی کـوردی وعەجـەمی هـاتبیتوەك ئۆتۆنـۆمی ،ئەسترۆنۆمی ..ئەو نۆمیانە وناموس یەك سەرچاوەن ،بەلام ئیستا لەناو کورد ناموس بە مانا ئەخلاقیەکە بەکاردیت ،بینـاموس مانای بیقانونی ناگەیەنی بەلکو بیرەوشتی دەگەیەنێ.

بێت،لای پیاو بە بنەماڵەوخێلەوە شانازی پێ بکەن ولای ئافرەتیش داماو،ئەو کاتە سزای ئافرەت دەدرێ وپاداشی پیاو دەکرێ، لەو بارو دۆخەیە کە کچێکت بوو ڕووت گرژ دەبێ،زاوا بوون شەرمە دەبێ لەلای خزم وکەسی ئافرەتەکە،ئەو کاتە ئافرەت بە مرۆڤی تەواو هەژمار ناکرێ بایاساو شریعەتیش پێچەوانەی ئەو نەریتە لە دەسەڵاتابن، هەمو ئەو دۆزانە ژێر خانێکی تری هەیە وراستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بۆچی لایەنی جنسی ئافرەت عەیبەیەو لای پیاویش مەردایەتیە،هەموو ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیەکی سادە ئەگەر لەوێ چارەسەر بوو باقی کێشەئاڵۆزەکان چارە دەبێ، ئەویش بەوە دەبێ کە بتوانی کۆمەڵگایەکی وا دروست بکەی تیایدا پرۆسەی جنسی نێوانیان مانای سایکۆلۆجی وکۆمەڵایەتی لاوازنەبەخشێ،بەو ئارستەی پیاو تیایدا براوەو سەربەرز ئافرەتیش دۆڕاو شەرمەزاری ،تائەو ڕادەیە چۆن کەس وکاری پیاوەکە سەربەرزن بەو پرۆسەیە ئاواش لای ژنەکە ...ئەگینا ئەوکێشەیە چارەسەر نابێت ،سزای ئافرەتیش دەدرێ پیاویش خەڵات دەکرێ هەرچەندە شریعەتی ئیسلام سزاو پاداشی بۆ هەردوو ڕەگەز بەیەکسانی داناوە بەڵام نەریتی کۆمەڵگە تا ئەو ساتەش نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە بتوانی پێی قایل بێت ،ئەوەش پێویست بەدروست کردنی کۆمەلگەیەکی سەرووی مەدەنیەتە کەتاکەکان وسیستەمەکەی بە بیرو باوەڕێکی ئەوەندە پتەو دامەزراو بن دەرباز بووبن لە نەریت وشەرم وعەیبەی بێ بنچینە.

ئەوەیان چارەسەریە بنەماییەکانی ئاینیە ، لەبیرمان نەچیت زۆر بۆچوون هەیە گوایە لەسۆنگەی ئاینیە هەلویستی نیگەتیڤە بەرامبەر ئافرەت ، ئەوەش لە ئاینەکانی تر گەیشتۆتە ئاستی دەق ، هەرچی لە ئیسلامە گەیشتۆتە ئاستی فقهو هەندی فەرمودەش، بەلام عاقلمەندانی ئاینی دەلین دەقەکانی ئاینەکانی ترو خودی ئەو فەرمودانەش جیی گومانن کە دەقی تەواو بن بەلکو دەستکاری کراون .

<u>دەمارگیری فیمینیزمی</u>: مافی ئافرەت لە بنەچەدا ڕەوایی خۆی هەیە بەڵام سوڕدەدرێ وبەلایەکی تری مەترسیدار دەڕوا، لە بەشێکیان دا شۆڕش و یاخی بوونە لە نێو خێزان وکۆمەلگەو وسروست وگەردوونیش،تەنانەت دژ بە ئافرەتانی تری تەمەن پیر،دژ بەدایك وخوشك وزۆرلای تری بێ تاوانە

،خۆی لە قەرەی بزوتنەوەیەکی فاشی دەدا ،بە تایبەتی لەو کاتانەی تەنها داواکاریەکان قەتیس دەکرێنەوە لە کچە گەنجەکان ی تەمەن نێوان 16 تا28 سالی .

زۆر جاری تر دەبینین ئەوانەی کێشەی ئافرەت بەرز دەکەنەوە پیاون، یان ئەگەر ئافرەتیش بن پیاویان لە پشتە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ،بەو شێوەیەش زۆربەی ڕێکخراوە ئافرەتیەکانیش پاشکۆی لایەنێکن کە پیاو بە موتلەقی بەسەری زاڵە، ئەوەش بە ڕوونی بەکارهینانی ئەو مافەیەلە قازانجی لایەنی تر، دەبێتە مەیدانیکی ململانیی بەدەر لە مافی ئافرەت، هەندی لەنوسەران وئافرەتەکانیش بەگەر ڕاپێچی ئەو نووسەرە پیاوانە کەوتوون کە هەندێکیان رەخنەکانیان لەجێ یە بەلام هۆیەکانیان دایتە پال (سیستەمی باوکایەتی)کە دەبوایە هۆیەکەی لەسیستەمی کۆمەلایەتی یەکە ومدرسە فکریەکان و دەستورو عادەت و نەریتە کۆمەلایەتیەکان بگرتایە ، بەشیکیشیان گەیشتونە ئەو ڕادەیەی بلێن پیاو لە پیناو ئافرەت دروست بوە ،بە پیچەوانەش بەشیکی فراوانی (بەتایبەتی فقهی)پێی وایە ئافرەت لە پێناوی پیاو دروست بوە ، دوو بۆچوونی تەواو پیچەوانەن،لە یەکەمیا کۆمەلگەیەکی مێینە دروست دەکا تیایدا سیستەمی دایك سالاری دێتەدی،لەدوەمیشا سیستەمی نیرینەوباوکسالاری ،کە هەردووکیان هەلەن و کۆمەلگەی دروست ئەوەیە مرۆڤسالاری بیت ،وەك لە قورئان یەکلای کردۆتەوە (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) ، بەلام پرسەکە بەوە نەوەستابەتایبەتی لەلایەن بیری مارکسیەوە پیی وایە پیاو برجوازیەو ئافرەت پرۆلیتاریا ،بۆیە نیوانیان ململانییە نەك تەبایی، بەو شێوەیە بزوتنەوەی ئافرەتان وەرچەرخا بۆ بزوتنەوەیەکی فکری تیایدا داوای یەکسانی تەواوی پیاو ئافرەت کرا ، بەوەش نەوەستا تا ڕادەیەك بەرەو بزوتنەوەیەکی دەمارگیری وئافرەت بە ئەسل زانین دژ بە پیاو پۆلین بکرێ ،بەو شێوەیە بەشێك لەو بزوتنەوەیە بوە بزوتنەوەی مێینایەتی (فیمینیزم) و بوە بەشێك لە شارستانی نوێ ، کارگەیشتە ئەوەی زیاتر سەربەستی درا بە لایەنە جنسی و تێکەڵاوی و.... لە ئەنجامدا کۆمەڵێك سەرەنجامی سلبی لێ پەیدا بوو لە گەشە نەکردنی زانست و زانیاری لێان, لە سیاسەت, لە بوارەکانی تری وەرزش, کۆمەڵایەتی, ئاینی ... ئیتر ئەنجامی تری وەك ئایدزو زوهرە سیلان ... بووە هۆی کەم بوونەوەی ئەو بانگەشەیە بەرەبەرە و ئێستا

زۆربەی داعیەكانی مافی ئافرەت لە ئەوروپا وازیان هێناوە زیاتر لە كۆمەڵگەی جیهانی سێیەم ئەو بانگەشەیە ماوە ... لە كوردستانیش هەروەها .

ئێستا لە ژێر باری سیستەمی نوێی جیهانی ئەو بزوتنەوەیە سارد بوویتەوە ،تەنانەت لە ( سیٚ ئارِستەكەی نێو كۆنگرە پكین)ئارِستەیەكیان بە رِابەرایەتی نەجات خانی پاكستانی رِای وابوو كۆتایی بە بزوتنەوەی ئافرەت بهێنرێت ،لە هەمان كۆنگرەدا چالاكوانی پۆلەندی( ئەجنیشكا گراف ) توێژینەوەیەكی بەناوی(مفارقات الكرونولوجیا النسویە فی بولندا المعاصرە)تیایدا هاتوە كە پەرچە كردار وادژی بزوتنەوەی ئافرەتان دروست دەبێت وپێشنیاری دەستكاری لە بنەماكانی كرد كە زیاتر مرۆڤایەتی بگرێتەوە ، ئیستا بانگیشەی مافی ئافرەت زیاتر قەتیس ماوە لە جیهانی سێیەم و وولاٌتانی دیكتاتۆر هەم لەویٚ مافی ئافرەت لەگەل مافی پیاو نەماوە هەم بە رِوالەتیش زۆر داكۆكی لە سەر دەكریٚ ، ئێستا لە وولاٌتانی عەرەبی ولە دەسەلاٌتی كوردیش زیاترین رِێكخراوو سەنتەر و ناو هێنانی ئەوانە كەچی  زیاتر لە لای خۆیان دەچەوسێتەوە  .

## جیندەر

لەبنەچەدا جەندەر ووشەیەكی لاتینیە بەمانای جنس ،لە كۆتای سەدەی بیستەم وەك زاراوەیەكی ئافرەتان دەركەوت ،بەمەبەستی لادانی جیاوازیە كۆمەلایەتیەكانی نێوان نێرو میٚ بەهۆی جنس،دەگۆتریٚ یەكەم جار نوسەریك بەناوی (ئۆن ئۆكلی) ئەوزاراوەی بەكارهێنا لە حەفتاكانی سەدەی رِابووردوو[591]،دوای لەكۆنگرەی (السكان وتنمیە) لەقاهرە سالی 1994 بەكارهات ،لەبەلگەنامەكانی كۆنگرەی 1995ی پكینی ئافرەتانی 233 جار لێی دووبارە بوویتەوە ،لەو كۆنگرەیە 189وولات بەشداریان كرد.

ئارِستەی نویٚ زیاتر بەلای لادانی جیاوازیەكانی نێوانیانە ، یان بەلای كەمەوە ئەو جیاوازیانەی نێوان نێرو میٚ نەبێتە بنچینەی دابەشی ئەرك بۆ جندەر ، هەندیٚ تەقەلای دەگمەن كراوە پیشوو تر بۆ دۆزینەوەی زەمینەیەكی یەكسان ،لەوانە( فرۆید) و زۆر لەزانایانی سەردەم لەهەل و مەرجی عەقلی و

---

[591] قاموس المصطلحات المدنیة والسیاسیة –د صقر الحیالی واخرین ص66

کۆمەلایەتی زەمینەی یەکسانیان نەدۆزیتەوە، وەك بی ئومێدیەك بەدوای هۆکارێکی لاوازی دەگمەنی وەك (یەکسانی هێزی گەشەکردنی توانای هەردوو ناوکی هێڵکوکەی ئافرەت و سپیرمی پیاو) گەراون ،دەلێن هەردوولا (واتە سپیرم و هیلکوکە ) بەیەك قەبارەتێکەل دەبن کەرەنگە ئەوە بەلگەی کۆمەلایەتیمان بداتە دەست بۆیەکسانی مافی کۆمەلایەتیان )!... ئەو یەکسانیە لە زۆربەی کۆنگرەو بڕیارە نیودەولەتیەکان هاتوون ڕێکەوتنی(مافی سیاسی ئافرەت ) لە 1952،بڕیارِ ژ:1921ی رۆژی 5/کانونی یەکەمی/1963ی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئینجا ڕێکەوتنی (قەلاچۆی جیاوازی دژی ئافرەت —سیداو) لە1979،دوای ڕێکەوتنی (دەرکێشانی توندو تیژی دژ بە ئافرەت )لە1983 .. تا دەگاتەکۆنگرەکانی مکسیکۆ لە 1975 وە کۆبنهاگن لە1980 و وپکین لە 1995- لەو کۆنگرەیە 189وولات بەشداریان کرد..،لە چوارچێوەی جارنامەکانیش لە مادەی (13 -لقی ب) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و جارنامەی (مافی مرۆڤ-بەتایبەتی مادەی2 ومادەی 16)، هەروەهاجارنامەی(میساقی مافی ئافرەت)لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە1954/7/7 ، لەخودی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکانیش جارِی یەکسانی مافی ئافرەت وپیاودراو بەند کرا بە مافی چارەنوس[592] ،دوا هەنگاویشی قەلاچۆی هەمو جۆرە جیاوازی ودژایەتیەکی نەژادی ئافرەت لە خولی (54)ی نەتەوەیەکگرتوەکان لە15/ئۆکتۆبەر/1999 جاڕدرا ،هەرە توندەکەی مادەی(1)ی ڕێکەوتنی سیداو چەمکی جندرە کە بەهۆی سەپانی هاوتایی ژن وپیاو کاری هاوتاشیان پێ دەسپێرێ بەناوی یەکسانی ،زیاتر لەهەموان لە مادەی(3)ی (العهدالدولی الخاص بالحقوق المدنیه والسیاسیه) هەروەها لە بڕیارِ ژ:2200ی سالی 1966ی (جمعیه العامه)ی نەتەوە یەکگرتوەکان،پێیان وایە هەمو ئەرکێك بەپیاو بکرێت بە ئافرەتیش دەکرێت ،لەوەوە جندەر ئاوەلناوی تری وەك یەکسانی جندەری و جندەری جنسی وکۆمەلایەتی وسیاسی وئابووری .. وەرگرت ،بەکورتیەکەی ئامانجی هێنانەدی یەکسانیەکی ڕەهایە ، ئەوەش لەکاردانەوەی ئەو تێڕوانینە فراوانەی لە کۆن ونوێیوە بۆ ئافرەت کراوە کە جیاوازن لەگەل پیاو ،لە ئەرك وماف و پسپۆریدا ،مەیدانی تویژینەوەکان لێرەوە دروست دەبێت کە پەڕەگریەك لەدوولا دەبینێ ، هەندێك زیاتر لەوە ڕەتدەدەنلە ئاینە جیاجیاکانو

[592] بڕوانە دەقی بڕیارِ ژ:1514 ی خولی 15 ی ئەنجومەنی ئاسایش 14/دیسمبر/1961

هەندێ فەقیهی ئاینی ئیسلامیش دەڵێن ئافرەت مەخلوقیکی جیایە ئەهلی جندەریش دەلین تەواو یەکسان ، دوای لە مەیدانی زانستیش هەندێ جیاوازی لە ئافرەت دۆزرایەوە ڕێگر دەبێت لە یەکسانی ئەرك ،لەوەوە هەولدراوە ئەو جیاوازیانە لادرێت تالە مافیشا یەکسان بن ،کیشەکە لیرە دێت مەرج نیە ئەرك وماف یەکسان بن،لەگەردوونیش ئەو هاوکیشەیە نیە ماف وئەرك بەرامبەر یەك بن ،هەتا لە لەشی مرۆڤیش دەبینین دل زۆر ماندوە لەکاتیکا میشك پشودانی هەیە ،زمان وچاو هەمو دەم کاریان نیە ،هەموشی گرنگن ، لەلایەکی تر یەکسانی هەمودەم مانای دادگەری نیە .

ئەوانەی پێیان وایە ئافرەت بەهۆی جندەریەوە پاش دەکەویت لە کۆمەلگەو نابێتە داهینەرو پیشڕەو هەر لە مەیدانی فقهی قەتیس نەماوە چوویتە مەیدانەکانی سۆسیۆلۆجی وسیاسیو زانستی وفکریش ،هەندیکی لێهەلدەبژێرین :

1- عەقلیەتی ئافرەت سەرقالی (مندال بوونە ) ،زۆربەی مێشکی پەکی بەوە کەوتووەو ناتوانی بپرژێتە سەر بوارەکانی تر،یان هەربنچینەیەکی سایکۆلۆژی بۆعەقلیەتی ئافرەت دادەریژی(وەك فرۆید)دەلێ دەبێتە هۆی لێك جیابوونی نەفسیەتی ئافرەت و پیاو لەژیانی (تناسلی) دا سەری هەلداوە، کەبەدەوری خۆی کار لە( نیوەمیشکی تەرخان کراو دەکات و ئافرەت لەباریکی عەقلی جیا لەپیاو دەردەخا)[593] .

دوەمیان – ئەو جیاوازیە چەندایەتیەی لەقەبارە و سەنگی میشکی ئافرەت و پیاو هەیە ... نێوەراستی جیاوازەیەکە دەکاتە 1400 گم پیاو – 1130گم ئافرەت یەکسانە بە 270 گم جیاوازی ([594] ) ،کۆمەلێك لەزانایانی نەفسانی وەك (بیل) – (رۆلف مارتن) ئینجا فرۆیدیش تۆماریان کردووە کە ئەو جیاوازیە لەقەبارەو کێشی مێشکی پیاو ژن ناگەڕێتەوە بۆ هۆیە کۆمەلایەتیەکان، یان بۆ سەردەمێکی میژوویی ، بەلکو (وەك دەڵێن )گەڕاون بەناو پاشکەو تووترین هۆزەکان بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو جیاوازییە هەر هەبووە و هەر دەشمێنێ ،ئەوەشیان کردۆتە بنچینەیەك بۆ لاوازی عەقلی ئافرەت ، ئەو تێڕوانینە زۆر کۆنە لە ئەدەبیاتی یۆنانی و لە (رسالە

---

593 - نظرية الجنسية ص 93 .

594 - نظرية الجنسية ص227 .

السياسه )ی ئەرستۆ وتەورات و ئینجیل و ئەو باسه هەیه ، بەو هۆیانه فەیلەسوف و قەشەی بەناو بانگ تومائەکوینی دەڵێ ئافرەت نوقستان وپەراوێزی دروست کراوه ،شۆبنهاوەریش له کتێبی (کلمات عن المرأه) دەڵێ خۆ عەقلی ئافرەت به قەد عەقلی پیاو نیه ئیتر بۆ ئەو زولمه له پیاو دەکرێ وبەئەندازەی پیاو مافی هەبێ ، له بەشێك له زانایانی ئیسلامیش ئافرەت به (ناقصات العقل )هەژمار دەکا ، زۆربەی سەردەمەکان ئەو تێڕوانینه بۆ ئافرەت هەبوه بەتایبەتی له ئەوروپا ،جاروایه هەندێ جۆره مرۆڤ به (ناقص)هەژمارکراوه ،وەك له تیڕوانینی یۆنانی کۆن وناو هەندێ بۆچوونی عەشایەری و ..،لەقورئان ئەوه ساغ بوویتەوه که خودا مرۆڤی به (ناقص)دروست نەکردوه (لقد خلقنا الانسان في احسن تقويم )

لەوەوه نابیت مرۆڤ ناقس بیت چ ژن چ پیاو وەك پاگندەی ئەوه بۆهەردوولا کراوه ،هەروەك لەکۆمەلگەی یۆنانی له کۆی 300000 هاوولاتی له ئەسیناو دەوروبەری تەنها30000کەس مافی بەشداری بڕیاڕو هاوولاتی بوونی ڕاستەقینەبوه،ئەوانی تربه مرۆڤی ناقس هەژمارکراون ،بریتی بووینه له(کۆیلەو بیانی وئافرەت )[595]،نزیك لەوەش بەشی زۆری فقهی ئیسلامی ئافرەتی به لاواز وەسف کردوه هەروەك انورجندی چینه لاوازەکانی کۆمەلگەی واڕێزکردوه(ئافرەت-هێتیم-هەژار-کۆیله-ڕێبوار)[596] .

بەشیکی تر هەولی ئەوەی داوه جیاوازیەکان له ئەنجامی جم وجۆله کۆمەلایەتیەکان قەتیس بکات ،هەردوو مەدرەسەی لیبرالی وسۆشیالیستی وبەشی زۆری نوسەرومەدرسه فیکری و ڕێبازه سیاسیەکان کیشەی ئافرەت بەکیشەیەکی سەربەخۆ دەزانن به جیا له گیرو گرفتەکانی کۆمەلایەتی , هەروەها جیاوازی نێوان پیاوو ئافرەت دەگێرنەوه تەنها بۆهەل و مەرجه کۆمەلایەتیەکان، بۆیه چارەسەرەکانیان بەزۆری بەبڕیارو چەسپاندنی ئەو یەکسانیه یه ،ئەگەر بەوشیوه بۆچوونانه بوایه دەبوایه ئیستاو چ لەقولایی میژوو بزوتنەوەیەکی ئافرتانمان بدیبایەوه له پیاوان هەلستانایه وەك چۆن بزوتنەوەی سپارتاکۆسی بەندەکان ڕوویدا، یان حزبیکیان دەبوو، لەوەش زیاتر وەك زانستی میژوو

---

[595] قانون الشعوب ص88 .

[596] انورجندی-المعلمه الاسلامیه ج1ص630

دەبوایە ئافرەتان زمانێکی جیاشیان لەگەل پیاوان هەبوایە... ،بۆیە کیشەی ئافرەتان بریتی نیە لەجیاوازیەکانی لەگەل پیاو(جندەر)[597] ، بەلکو بەجمکی و خورِسکی ئەو جیاوازیانە هەیە، بەهەردوولایان " یەکەیەکی" تیروتەسەل تەواو دەکەن ، ئەسلی کێشە کە لەوە سەر هەلدەدا کاتی ئەو جیاوازیانە بکرێتە جیاوازی مرۆڤایەتی بەنوقستانی بژمیردرێ ،بەشداری چالاکی ژیانیان پی نەکەن وەك تابعیکی سانەوی و سەلبی حیسابی بۆ بکری، کەلە زۆر لەبۆچوون ونەریتوهەندێ ئاینیشدا رەگی داکوتاوە[598].

## یەکسانی جندەری  ودادگەری

لەکۆنەوە فیساگۆرس لە چوارچێوەی دنیابینی لە رِوانگەی ژمارە پێی وابوە جیـاوازی نێـرو مـێ قوولە، تاکەکان نێرن وژمارە جووتەکانیش مێ،هەندێکی تر پێیان وایـە ئاسمـان نێـرەو زەویـش مـێ ،(گریمۆس)ی هۆلەندی ووتبووی جیاوازی نێوان پیاو ژن ئەزەلیە ،لەوەش زیاتر (جۆن گرای)پێـی وایـە جیاوازیان ئەوەندە زۆرە کتێبێکی بە ئەدرێسی (پیاو لە مریخ وئـافرەتیش لـە زوهـرە) بلاوکـردەوە، هەندێ تەقەلای تر لەو رِووەوە زۆرنامۆیە نەك بە ئاین تەنانەت بەمرۆڤایەتیش گوایە (میز)ی ئافرەتی کەنیزەو ئافرەتی سەربەستیش وا لێك جیایە ،برِوانە ئەو فەرموودە دروسـت کـراوە : عن أبي السمح رضي الله عنه: أن النبي قال: «**يغسل من بول الجارية، ويرش من بول الغلام**» [599].**فإن العلماء حاولوا التماس حكمة في سبب التفريق بين بول الجارية وبول الغلام من حيث التطهير، من ذلـك مـا ذكـره أبـو اليمان المصري رحمه الله حيث قال: سألت الشافعي عن هذا الحديث، فقـال: لأن بـول الغـلام مـن المـاء**

---

[597] وەك لە مەوسوعەی لالاندیشئەو زاراوە تایبەت ناکا بە هەردوو رِەگەزی ژن وپیاو ..بەلکو دەلێ هەرووهاوتا کە هەندێ لایان لەیەك دەچی .

[598]لە تەورات لە ئایەتەکانی 22تا 25 لە سفر التكوين 2 باس لە دروست بوونی حەوا دەکا لە پەراسوی ئادەم و لە پێناو پیاو .

(599) أخرجه: أحمد (المسند) 76/1 ، 97 ، 137، وأبو داود رقم 387 ، 389، والنسائي برقم (304)، والترمذي برقم (610) وحسنه، وابن ماجة رقم (528)، 531 – 533، وغيرهم.
وصححه الحافظ في (التلخيص) 28/1، ونقل عن البخاري والدارقطني تصحيحه، وكذا صححه: أحمد شاكر في تعليقه على (المسند) رقم (563)، والألباني في (الإرواء) رقم 166.

والطين وبول الجارية من اللحم والدم، ثم قال: لي: فهمت؟ قلت: لا، فقال: إن الله تعالى لما خلق آدم خلقت حواء من ضلعه القصير، فصار بول الغلام من الماء والطين، وصار بول الجارية من اللحم والدم، قال لي: فهمت؟ قلت: نعم، قال: نفعك الله به [600].

لەگەل زۆری تر لەو شێوەیە، لەڕاستیشدا بەدەیان جیاوازی هەیە وادەکا ئەرك وفرمانی ژن وپیاو لێك جیا بێت،وەك جیاوازی تواناو ئەرکی ئەلەکترۆن وپرۆتۆن لە ناوخێزانی گەردیلە ڕۆڵی گرنگی هیچ لایەك کەم ناکاتەوە ،ئەو کاتە ناسنامەی مێینەیی یان نیرینەیی مانای دابەشی پلەی کۆمەلایەتی نابەخشێت وەك لە (موسوعة البريطانية) بۆی چوە و دەلێ : (شعور الانسان بنفسه كذكر اوكأنثى ).. جیاوازی مانای هاولاتی پلە یەك ودوو نیە هەروەك (د محمدخاتمی) دەلێت ئافرەت وپیاو لێكجیان بەلام دەبتە کارەسات ئەگەر ئەو جیاوازیە بکرێتە هاوولاتی پلە یەك ودوو[601]، بۆیە داوای یەکسانی کردن داوایەکی عەبەسیە ،یەکسانی بەکێ؟بەکام جۆرە پیاو ؟برجوازیەکان یان شۆڕشگێرەکان ڕەش سپی ..کامەیان؟ بۆ پیاو ئەوەندەباشن تا ئێوە یەکسانی ئەوانتان بوێ؟ ئەگەر پیاو چەوسێنەر وبورجوازی بێت لەناو خێزان ئێوەش دەتانەوێ ببنە برجوازی یاخود دادگەریتان دەوێ تا بەیەکجاری چەوسانەوە نەمێنێت؟

بەتێکرایی کۆمەلێك تایبەتمەندی جیای لەیەکتر هەیە لە هەندێ مەدرەسەو تەیاری تر حسابی لەسەر دەکەن بە تایبەتی تەیاری ناشیۆنالیزمی، کەچی لە ئاین ومەدرەسە ئومەمیەکان شکلیە،جیاوازیەکان دووتەوەرە ،یەکەمیان زمانیان لێك جیایە – ڕەنگیان – بالایان – ڕەچەلەکیان – خوێنیان – پایەی کۆمەلایەتیان ...دوەمیان بریتیە لە جیاوازی فەرهەنگ و ئایدیو لوجیایان (ئایین – خوونەریت – مەیلی سیاسی و ...) ،دیارە تەوەرو بەشی یەکەم سروشتین و میراتە بوون ونەبوونی لەدەست ئەو تاکە نیە ، زمان و بالاو ڕەگەزو ڕەچەلەکی چیەو بەویست و کۆششەکانی ناگۆڕێت،ئەوەیان لە ئنسرۆ پۆلۆجیا بە فاکتەرو ئینتمایە ستوونیەکان ناوزەد دەکرێت ، لە ئاینی ڕەسەن هیچ بەرپرسیاریەتەکی تیانیە، ئەوەی گرنگە بەشی دووەمە،کە بەفاکتەرو ئینتمای ئاسۆی ناو دەبرێ کە بریتیە لەچالاکی و

---

[600] سنن ابن ماجة ج1ص262 - .أخرجه ابن القطان في زوائده على ابن ماجة رقم 37.

[601] محمدخاتمی – المجتمع المدنی (مقاربات فی دور المرأه والشباب) ص32-33

بەرهەمەکانی ئایدۆلوجی و (ئەقلی) کە لەدەست ئادەمیزادەکە خۆیەتی ، زاڵە بەسەر گۆڕانکاریەکانی ئەقلی خۆی ،میرات نیە بەلکو وەردەگیریێو پەیدا دەکریێ (موکتەسەبە)، ئالیرەیە (دورکایم) و (سپنسر) و (مارکس) و (پاڤلوڤ) و مدرسەی (یۆنگ) و هەندی زانای ئیسلامی و کۆمەلێك زانای تر لە وەڵامی ئەوپرسیارە (لە ژێر تویێژینەوەی زانستی)بەهەلەدا چوونە ئاخۆ ئادەمیزاد لەکیێ (مسەیەرە) و بە چ ئەندازەیەك (مخەیەرە) ؟ لەئاینی دەستکاری نەکراو تەنها حیساب و بەرپرسیاریەتی ئادەمیزاد لە بەشی دووەم(موخەیەرە) دەکریێت ، واتە: موکتەسەبەکە نەك میراتەکە ،موخەیەرەکە نەك مسەیەرەکە، گۆڕاوەکان نەك چەسپاوەکان،..بە کورتی لە ئاسۆییەکان نەك لە ستونیەکان .

لەچوار چێوەی ئەو جیاوازیە کۆمەلایەتیانەی بەشی یەکەم ئافرەت وپیاویش کۆمەلێك جیاوازی بەدەرلەئارەزووی خاوەنی هەیەلە: توانا،ماسولکە،دەنگ،ڕەنگ،جیاوازی لەپێگەیشتنی جنس،لەهەست ونەست ،تەنانەت شانەکانیشیان لێك جیایە ، لەڕووی توانای لەش ودۆخی دەروونی هەل و مەرجی بایۆلوجی و فسیولوجی ،ئینجا لەرووی پسپۆری ئەرك و کۆمەلێك جیاوازی خورسکی تر، تاکە یەکسانیەك کەبێتە دی لەئەقلدایە،بۆیە چارەسەری ڕاستەقینە ئەوەیە جیاوازیەکان بۆ کارو فەرمانی جیا ویەکسانیەکەش بۆکاری مرۆیی ، لە کۆمەلگەی ستونی ئەو جیاوازیانە دەبێتە بنچینە بۆ جیاوازیەکی چینایەتی ،لەو کۆمەلگانە هێزی ماسولکەو کۆمەڵایەتی بەدیلی هێزی عەقلانیەتە، پیاویش لەئافرەت بەهێزترە،بۆیە ئەفزەلیەتی پیاو بەسەر ئافرەت ڕوودەدا ،لێرەدا ڕۆلی یاسا وەك کارکەرێکی ئەخلاقی بۆ بیێ دەسەڵاتەکان بەسوودە، ئەوەش دەروازەیە بۆ دۆزینەوەی چارەی ڕیشەیی کێشەی بیێ دەسەڵاتان بەگشتی وئافرەت بە تایبەتی ،هەر بەو هۆیەشەوە بۆمان دەردەکەویێ کە عاملی (ئەقل ) بەتاقانەییە کە هەردوولا (پیاو وژن) بەیەکسانی بەشدار بن لەجم و جولەکانی فکر یان عەقیدە و بروایە کانیان لە رەوشت و رەفتارو تیێ روانینە کانیان،لێرەدا ویستراوە گورزێکی ئەزەلی لە مافی ئافرەت دەدریێ بەوەی گوایە مێشکی ئافرەت بچوك ترە لەمێشکی پیاو وەك لەمدرەسەی فرۆیدودەروونناسەکان جاڕدرا،هەروەها نوقستانی ئەقلی ئافرەتانیش لە مدرسەی کۆنی یۆنانی وچینی وهندی ولەتەورات وئنجیل وبەشێك لە فقهی ئیسلامیش پێشاندرا، ئاینە ڕاستەقینە

بیّ دەستکاری کراوەکان لەقولاییەوە بە پێچەوانەی مدرەسەکانی تر هەموو ئینتمایەکانی وەك بنچینە بۆ پۆلین (تصنیف) کردنی ئادەمیزادی ڕەت کردۆتەوە ،تەنها عاملی ئەقلی وەردەگرێت، کە هەر هەموو ئادەمیزادێك بە جیایی ئنتماکانی ستونی وئاسۆییەوە بەیەك ئەندازە دەتوانن لێی بەشدار بن، لێرەدا جیاوازی ئافرەت و پیاو لەچوار چێوەی جیاوازیە گەردوونیەکانی وەك ڕۆژ و مانگ و هەواو ئاو وئاسن و.. لێك جیان ،کانزاکان لێك جیان لەبەکار هێنان و سودو سیفاتی کیمیایی و فیزیاییان،خواردەمەنیەکان لە سودو خۆشی وکەمی و زۆری... لێك جیان ، قورئان باسی (افضلیةتی) کردوون (تلك الرسل فضلنا بعضهم علی البعض ..البقرة-53) ، ئەو جیاکاریانە مانای (فضل) لەمرۆیی نیە ، بنچینەکە ئەوەیە کام ئادەمیزاد دۆخی فکری بریتی بوو لەڕژێمی سیاسی و کۆمەلایەتی مرۆڤایەتی و داد پەروەرانە بێت ، رەفتارو کارەکانی بەو پێیە بێت ،ئەوا ئەو ئادەمیزادەیە گەورەترو(ئەفزەل تر) ،جا پیاوە ئافرەتە ئەلمانیە بی کەسە...(ان اکرمکم عند الله اتقاکم)، تەنهاوەبەتەنها لێرەوە ئەو دادگەریە دێتە دی، زیاتر لەوە دەقاو دەق هەرئادەمیزادیك رادەی مرۆڤایەتیەکەی بەوە دەپیورێ کە تاچ رادەیەك ئەقلی (ئەخلاق) زاڵە بەسەر ئارەزووەکانی، کە ناکۆکیەکی سروشتی یە لەناو ناخی هەموو ئادەمیزادێك، ئەسلی ناسین و پۆلین کردنی ئاین بۆ هەر ئادەمیزادێك وەستاوە لەسەر ئەنجامی ئەو ناکۆکیەلەسەر دونیاو لەقیامەتیشدا[602] ، دیارە ئەوە بە پێچەوانەی مدرسەی شیوعیەت وهەندێ لای تر ئەقل ناکاتە بنچینە ،سەرنج بدە ئەنجلس دەلیت :بۆ ناسینی تەبیعات و ئینتمایەکانی بەشەر سەیری کەللەو سەری ئادەمیزاد مەکەن بەلکو سەیری دۆخی ئابووری وبازارەکەی بکەن ،یان دەلێن میژوو لە گەدە دەستی پی کردووە نەك لەئەقل ،هەشە دەلێت لەئامیری جنسی و ئیدیش دەلێن لە (زمان) و سوپەرمانەکانیش دەلین لە (خوێن) ....، ئەوانە جیاوازی ڕووخسارین بە تایبەتی لە عەولەمە چونکە بەرە بەرە فاکتەری عەقل جێی ئەو فاکتەرانە دەگرێتەوە ،کۆمەل بە ئافرەت و پیاوەوە هەر دەبێت وەك (تۆینبی) گوتەنی دەبێت بەشەکانی کۆمەلگەش وەك لەشی ئادەمیزاد هەر ئەندامەی ئەرکێکی پێ سپێردراوە بۆی تەرخان کراوە، چاو بۆ بینین و دەست ماندوو ترە لە پرچ ،دڵ لەجگەرو.. هەریەکە بە ئەرکی خۆی ، دیارە لەو

---

[602] بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە :مەوسوعەی جودی –جەنگی نێوان ئەقل ودەروون .

ئەركە جیا جیایانەی  ناو كۆمەلیش هەریەكە جۆرە ئەركێكی پی رادەسپیردرێت ، ناتوانی ئەركی بگۆری هەروەك ناكری ئەركی دل بەجگەر بسپێری، لێرەوە چەمك وئامانجی (جەندر)زیادەڕۆكەی دەردەكەوێ وئاواش ناكرێ ئەركی پیاو بە ئافرەت بسپێری یان پێچەوانە ، ئەو ئەركانەش پیوەری مرڤایەتی نیە .

لەزەمانی یۆنانی كۆن  لەسەر زاری (دیمۆستین ) هاتووە و (ویل دیورانتی) تازەش هەردووبارەی كردۆتەوە و ئەركی ئافرەتیان داناوە بۆمانای جۆر (نوع )، ئەوەی ئەو بۆچوونە بەهێزدەكات هەندێ تیبینی ترە ،بۆنمونە :لە( اشهر علماء العالم واخترعاتهم) لە  یەكەم داهینەری ئەمریكی دەست پیدەكات كە تا دەگاتە دوا ناو(تسی أی لون105م)  چینی وەرەقەی داهینا تەنها یەك ئافرەتی تیدایە ،ئەویش ماری كوری(1867-1934ز) پۆلندیە هاوسەری پیركۆری مامۆستای كیمیا پێكەوە رادیۆمیان دۆزیەوە خەلاتی نۆبلی لە1911 كچەكەشی(ئیرین)هەمان خەلاتی وەرگرت [603]، كارۆلینیش چەندین ئەستێرەی كلكداری دۆزیەوەبەهۆی هاوسەرەكەی(هارشل) سەرقالی ئەو كارە بوە ،ست كارۆلین بوە ئەندامی (جمعیه الفلك الملكیه)[604]، ئەوەیان زۆر پالپشتە كە ئافرەت (ناقصات العقل)بێت ، بەلام وانیە بەدسەدان ئافرەتی فەیلەسوف وزاناو داناو داهینەرمان هەیە ناویان بزربوە نەخێر ئەركی مەزن تریشیان هەیە ، ە ژێر بیری (بەكەم گرتنی ئافرەت) ،بەلكو ئافرەتیش ئادەمیزادی تەواون دەتوانن ئەرك وپەیامی مرۆڤایەتی جیبەجێ بكەن ،دەتوانی ئەو نیو كۆمەلەی( واتە ئافرەتان) كەپەكیان خرابوو بەگڕیان بێختەوە بۆ پیش كەوتنی كۆمەل وگەشەپێدانی زانست و بەرهەم و هینانەدی دادگەری، ئافرەتیش لە نوقستانیەوە بۆ تەواوەتیەوە ،واتە دیویكی جەندەر كە بۆ ئەوەی ووزەو توانای ئافرەت پەك نەخرێ بە هۆی ئەو بەشە جیاوازەی لەگەل پیاو ،ئەوەیان خراپ نیە بەلام كاتێ جندەر ئاوەلناوی تری دەكەویتە سەر دەبیتە جیی تیڕامان ،ئەگینا ئەركە خواییەكە بۆ تیكڕای بەشەریەتە .زكە دەلی (انی جاعل فی الارض خلیفة)بة نیرومییەوە خەلیفەن .

---

[603] **اشهر علماء العالم واختراعاتهم – مادة:بیركۆری**

[604] موسوعة المشاهیرالعالم فی العلوم والفكروالسیاسة ج1 ص62

(19)

## ناوچەجێناكۆكەكان المناطق المتنازع عليها Disputed areas

**ئەوانەش دەگریتەوە (مادەی 140،ناسنامەی کەرکوك ، ناوچە دابڕێنراوەکان،سنوری خوارووی کوردستان،هیلی 36،...)**

بەو ناوچە کوردستانیانە دەووتریت (جیناکۆکەکان) کە لە ئەنجامی تەعریب کردن سنورە بنچینەکەی نیوان کوردو عرب تیکەل کراوە ، لەدوای 2003ز لە چوارچیّوەی دەستوری عیّراق زاراوەی ناوچە ناکۆکەکان سەری هەڵدا، مادەی 140ی دەستوری 2005ی بۆ تەرخان کراوە تا ساغی بکاتەوە، لیژنەیەکی فەرمی بەپیی فەرمانی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار (ژ:46) لە 2006/8/9 دەرچوە ، ئەو ناوە لەلایەك ئیجابیە کە ناوێکی یاسایی لێنراوە وەك ئەوە بێت لەنێوان دوو دەوڵەت، لەلایەکی تریش سەلبیە چونکە بە مسۆگەر ئەو ناوچەیە کوردستانیە بیدەیتە (ناوچەی ناکۆك) کە شەریکێکی لە خۆڕایی بۆ خۆت پەیدا دەکەی،بۆیە لەلای ئەدەبیاتی کوردیەوە بە(ناوچە دابڕێنراوەکان)ناوزەد دەکریت .

ئێستا بریتین لەو ناوچانەی خوارووی هیلی 36 و ئەو سنورەی کە لەکێشەی(ویلایەتی موسل) دیاری کراوە،ئەو شارو شارۆچکانەش دەگرێتەوە:ژەنگال-شیخان-گوێڕ-مەخمور-دیبەگە-سەرگەڕان-دوبز-پردێ-کەرکوك-قەرەتەپە-داقوق-دووز-مەندەلی-خانەقین-..کەدەکاتەلە42٪ی کوردستانی خوارووی.

**<u>دەقی مادەی 140:</u>** اولاً :ـ تتولى السلطة التنفيذية اتخاذ الخطوات اللازمة لاستكمال تنفيذ متطلبات المادة (58) من قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، بكل فقراتها. ثانياً :ـ المسؤولية الملقاة على السلطة التنفيذية في الحكومة الانتقالية، والمنصوص عليها في المادة (58) من قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، تمتد وتستمر الى السلطة التنفيذية المنتخبة بموجب هذا الدستور، على أن تنجز كاملةً (التطبيع، الاحصاء، وتنتهي باستفتاء في كركوك والمناطق الاخرى المتنازع عليها، لتحديد ارادة مواطنيها) في مدةٍ أقصاها الحادي والثلاثون من شهر كانون الاول سنة الفين وسبعة.

ماده‌ی(58)ی ئیداره‌ی( قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية)

المادة الثامنة والخمسون :

أ) ـ تقوم الحكومة العراقية الانتقالية ولا سيما الهيئة العليا لحل نزاعات الملكية العقارية وغيرها من الجهات ذات العلاقة، وعلى وجه السرعة، باتخاذ تدابير، من اجل رفع الظلم الذى سببته ممارسات النظام السابق والمتمثلة بتغيير الوضع السكانى لمناطق معينة بضمنها كركوك، من خلال ترحيل ونفى الافراد من اماكن سكناهم، ومن خلال الهجرة القسرية من داخل المنطقة وخارجها، وتوطين الافراد الغرباء عن المنطقة، وحرمان السكان من العمل، ومن خلال تصحيح القومية. ولمعالجة هذا الظلم، على الحكومة الانتقالية العراقية اتخاذ الخطوات التالية :

1. فيما يتعلق بالمقيمين المرحلين والمنفيين والمهجرين والمهاجرين، وانسجاما مع قانون الهيئة العليا لحل النزاعات الملكية العقارية، والاجراءات القانونية الاخرى، على الحكومة القيام خلال فترة معقولة، باعادة المقيمين الى منازلهم وممتلكاتهم، واذا تعذر ذلك على الحكومة تعويضهم تعويضا عادلا .

2. بشأن الافراد الذين تم نقلهم الى مناطق واراض معينة، على الحكومة البت فى امرهم حسب المادة 10 من قانون الهيئة العليا لحل النزاعات الملكية العقارية، لضمان امكانية اعادة توطينهم، او لضمان امكانية تلقى تعويضات من الدولة، او امكانية تسلمهم لاراض جديدة من الدولة قرب مقر اقامتهم فى المحافظة التى قدموا منها، او امكانية تلقيهم تعويضا عن تكاليف انتقالهم الى تلك المناطق .

3. بخصوص الاشخاص الذين حرموا من التوظيف او من وسائل معيشية اخرى لغرض اجبارهم على الهجرة من اماكن اقامتهم فى الاقاليم والاراضي، على الحكومة ان تشجع توفير فرص عمل جديدة لهم فى تلك المناطق والاراضي .

4. اما بخصوص تصحيح القومية فعلى الحكومة الغاء جميع القرارات ذات الصلة، والسماح للاشخاص المتضررين، بالحق فى تقرير هويتهم الوطنية وانتمائهم العرقى بدون اكراه او ضغط .

ب) ـ لقد تلاعب النظام السابق ايضا بالحدود الادارية وغيرها بغية تحقيق اهداف سياسية. على الرئاسة والحكومة العراقية الانتقالية تقديم التوصيات الى الجمعية الوطنية وذلك لمعالجة تلك

التغييرات غير العادلة. وفى حالة عدم تمكن الرئاسة الموافقة بالاجماع على مجموعة من التوصيات، فعلى مجلس الرئاسة القيام بتعيين محكم محايد وبالاجماع لغرض دراسة الموضوع وتقديم التوصيات. وفى حالة عدم قدرة مجلس الرئاسة على الموافقة على محكم، فعلى مجلس الرئاسة ان تطلب من الامين العام للامم المتحدة تعيين شخصية دولية مرموقة للقيام بالتحكيم المطلوب .

ج) ـ تؤجل التسوية النهائية للاراضى المتنازع عليها، ومن ضمنها كركوك، الى حين استكمال الاجراءات اعلاه، واجراء احصاء سكانى عادل وشفاف والى حين المصادقة على الدستور الدائم. يجب ان تتم هذه التسوية بشكل يتفق مع مبادىء العدالة، اخذا بنظر الاعتبار ارادة سكان تلك الاراضى.

## دروست بوون وگەشەی ئەو کیشەیە:

هەر وولاَتێك خاوەنی سنوری (دەستكرد) بیت وعادەتەن كێشەی سنوری هەیە چ لەناوەخۆ چ لەگەلْ دەرەوە،عێراق نمونەیەکی زەقی ئەو جۆرە كێشەیە،جگە لە ئوردەن وسوریا كە پێكەوە دروست كران بە پێی مادەی 94ی سیڤەر ئەگینا لەگەل هەمو لایەك كێشەی سنوری هەبوە، لەگەل توركیا بۆیەكەم جار لێژنەی (عصبه الامم)هات بەدووسال ئینجا توانیان سنورێك بەناوی برۆكسل[605] دیاری بكەن،لەگەل سعودیەو كوێت وئێران تائەو ساتە كێشەی سنوریان ماوە،لەناوەخۆش كێشەی پاریزگاكان ئینجا سنوری شیعە وسونەو.. كێشەی سنوری لەگەل كوردستان هەر هەبوە كە ئیستا پێی دەوترێ ناوچە جیناكۆكەكان .

هەڵبەتە سەرچاوەی هەموو كێشەكان لە دابەشی وبێ بەش كردنی كورد دێت كەلەدابەشیەكانی میراتی عوسمانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست و لە رێكەوتنەكانی سایكس-بیكۆ 1916 تا لۆزانی 1923 دێت، بەلاّم خودی ئەو كێشەیە ریشەیەكی تایبەتی بە خۆشی هەیە، یەكەم جار لەساڵی 1916 لەمادەی(1)ی ڕێكەوتنی سایكس-بیكۆ ئەو ناوچەیە جیاكرایەوە پیتی (B)ی پێدرا، بەلاّم نەخرایە سەر عێراق تەنها خرایە سەربەشی بەریتانی ، دوای ئەوەی بەریتانیا عێراقی دروست كرد و

---

[605] سنورێك بەناوی برۆكسل بە ئاشكرا گوزارش لەوە دەكا كە ئەو سنورە هیچ بنچینەیەكی جوگرافی وڕەگەزی وئاینی و مێژوویی نیە، بۆیە ئەو ناوەیان لێنا كە لەشاری برۆكسل دوا مۆری پێوە نرا ،وەك سنوری (كیرزۆن)ی نێوان روسیا وپۆلەندا،هەروەها سنوری نیوان هندستان وچین دەووترا هیلی ماكماهون

سنوری بۆ زیادکرد له عێراقی عەرەبی تێپەڕی بۆعێراقی عەجەم و دوایش کوردستانی خواروشی گرتەوە، ئینجا بیر له تەعریب کردنی ئەو ناوچانه کراوە، یەکەم تەعریب لەلایەن بەریتانیا کرا ویستی شێوازێکی عەرەبی بداته ویلایەتی موسڵ لەکاتی کێشەکەی ئەو ویلایەته له 1923- 1925 ،بە تایبەتی ناوچەکانی کەرکوك تا موسڵ پرۆسەی تەعریب بەناڕاستەوخۆدەستی پێکردلەحکومەتی(یاسین هاشمی[606])یەوەتا 1963، لەدوای ئینقلابی حزبی بەعس له 1963 و 1968 به ڕاستەوخۆ و بەرنامەی ڕێژی دەستی پێکرد.

ئەوەی زۆر ئەو کیشەیەی ئالۆز کردوە هەر پرۆسەکانی تەعریب نیە،وەك له تویژینەوە کوردیەکان دەرکەوتوە ،بەلکو هەندیکی هۆکاری هەلەی خودی کراوە ، یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی 1975 که لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەرچوو، دیسان ئەو ناوچانەی له هەرێمی کوردستان جیاکردەوەو که بە (منطقة كردستان للحكم الذاتي) ناوبرد، دەرچوونی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانی پابەند بە بەندی (7)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان هەر هەمووی ئەو ناوچانەی ئیستا پێی دەووترێ (جیناکۆکەکان)ی بەدەر له هەرێمی کوردستان پۆلین کرد، لەپێش هەموویان ناوچەی ئارامی سەرووی هێڵی (36)، ئینجا بڕیاری 986ی نەوت بەرامبەر خۆراك ڕێژەی 12٪ بۆ کوردستان هەژمار کرد که تەنها پارێزگاکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە، دوای داگیرکردنی ئەمریکاش هەر لەسەر ئەو سیاسەته ڕۆیشت، دەسەڵاتی کوردی لەماوەی 19 ساڵ له حوکمی نەیتوانی سەرکەوتوو بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانه، کارنامه یاسایی و سیاسی و ئەخلاقی و ئابووریەکانی سەبارەت بەو ناوچەیە لاواز بوو، ئینجا کێشەیەکی وا ئالۆز و گەورە به نەخشەو پلانێکی بچووك و خەم سارد ناکرێت، له هەمووی گرنگتر نەیانتوانی سەرنجی پێکهاتەکانی تر له تورکمان و ئاشوری و عەرەبی ناوچەکە بۆ لای خۆیان راکێشن ،ئەگەرچی هەندێ وڵاتی دەوروبەر ڕێگر بوون بەڵام ئەوە پاساوی ئەوە نادات که پاکانه بۆ هەڵس و کەوتی بەرپرسانی کورد بکرێت سەبارەت به داخوازیەکانی تورکمان و ئاشوری وەك پێویسته نەبوون، هەندیکیشی لەگەل ئالۆزی کێشەی کورد هەمان ڕۆڵ دەبینن، لەودەمە لەهەموان

---

[606]بۆیەش بکرسدقی کورد بیری له ئینقلاب کردو پەیرەوی کرد له 1936-بڕوانەیاداشتەکانی مەندوبی ئەلمانیا لـەعیراق فریتـز غروبـا لـە (العراق فی المذكرات الدبلوماسين الأجانب ) .

زەق تر وولآتانی ئیقلیمی وجامیعەی عربیە دژ بەوەن کەناوچە ناکۆکەکان ناسنامەی کوردستانی بدرێتیٚ .

له هەموی ئاڵۆزتر ئەوەبوو حکومەتی عێراق خۆی لایەن بووە لە ئاڵۆزکردنی، خۆی هەڵساوە بە تەعریب و کێشە دروستکردن، گوێی بە (10) بەڵێنامەکەی وەرگیرانی لە (عصبە الامم) و (بەڵێنەکانی راپۆرتی ویلایەتی موسڵ)، یاسای نێودەوڵەتی و ئەسڵی مانای دەوڵەت بوون و پارێزگاری و نوێنەرایەتی کردنی هەموو لایەك بە یەکسانی نەکردوە،هەلساوە بەتەعریب کەبەشی هەرەبنچینەی ئالۆزکردنی کێشەکەیە .

میژووی تەعریب زۆر کۆن نیە ،لەگەل دروست بوونی دەولەتی عیراقی دەست پیٚ دەکا بە نهینی ، بووە هۆی گۆڕینی نەخشەی دیمۆگرافی ناوچەکەو جێگیر نەبونەوەی تا ئەو ساتەش، ئینجا ناوی ناوچەو شار و گوندەکانیشی لە کوردیەوە کردە عەرەبی، لە هەموان ترسناك تربە بڕیاڕی (مجلس قیادة الثورة)بە ژ:41 لە29/ کانونی دوەم/1976ناوی کەرکوکیشی کردە تەئمیم[607] ،لەپاشان دەولەت لەسەردەمی حزبی بەعس خۆی بە تەعریب هەلساوە بەشێوەی بەرنامە داڕێژراوو بڕیاڕویاسادەرکردنبەو شێوەیەی خوارەوە:

1- مرسوم الجمهوری- بە مۆری احمد حسن البکرژ:608-1975/12/15هەردوو شارۆچکەی چمچمال وکەلاری لە کەرکوك داڕنی وخستیە سەر سلێمانی .

2- مرسوم الجمهوری- بە مۆری احمد حسن البکر ژ:33 لە25/کانونی دوەم/1976تیایدا کۆمەلێك گۆرانکاری ئیداری وڕەگەزی لە کەندیناوەوقراج دەکات، هەروەها بە پێی بڕیاڕی ژ:55(محافظة التأمیم) لە1976/3/2 ناوی گوندو شارۆچکەکانی ئەوناوچەیە بگۆڕدرێت لە کوردی بۆ

ج - پلانێکی تەعریب بە فەرمی داڕژرا لە 1993/4/5 بە پێی بریاری ژ:87/11/3 بەناوی (لجنە الشمال) پێك هاتبوو لە :(مزبان خضر هادی ،نوری فیصل شاهر،خضر عبدالعزیز الدوری،مزهرالعواد ،وزیر الداخلیة،مدیر جهاز المخابرات،مدیر الامن العام،مدیر استخبارات

[607] ئەو بڕیارە لە 1969 دەرچووبوو بەلام ئەو کاتی باری جێبەجیٚ کردنی ئامادە نەبوو.

العسكرية) هەمو ئەوانە بە سەرۆکایەتی طە یاسین رمظان ، 5مادەی تیادا هاتوە، یەکەم داکۆکی موتلەق لە عروبەی کەرکوك بەهۆی پڕکردنی لە عەرەب دەکا.

د- امر وزیر الداخلیە-ژ:10472-1993/9/19 مانەوەی تورکمان لەکەرکوك وکۆمپانیای نەوت بۆ ئەوەی لەکورد جیا بکرینەوە کە لەو کۆمپانیانیانە دەرکرین .

ح–فەرمانی (جیگری سەرۆك کۆمار **طە یاسین رمظان**) بە ژ:85/20 ی رۆژی1997/1/20 داوا دەکات ئەو میسریە حزبیانەی عیراق لە کرکوك دابمەزرینن .

بەهۆی ئەو پرۆسە ئالۆزانە ئەو کیشەیە دروست بوە ،دوورە لەوەی بانگیشەی ئەوە کراوە ئیستعمارو زایۆنی پیلان دەگیرن بۆ برایەتی کوردوعەرەب لەناو عیراق ،ئەوە خودی دەولەتی عیراقی بە فەرمی پیهەستاوە .

**رەهەندی دەولی لە ناوچە ناکۆکەکان:**

دوای ئەوەی یاسای نێودەوڵەتی خەملّی و دەوڵەتانی مۆدێرن دروست بوون بە سنورێکی نێودەوڵەتیەوە، کۆمەڵێك کێشە بەناوی ناوچە ناکۆکەکان (المناطق المتنازع علیها) سەری هەڵدا ، نمونەی جیناکۆکەکان لەجیهاندا: حەلایب دەکەویتە نیوان میسرو سودان لەسەر دەریای سوور رووبەرەکەی 20580کم ، دورگەی رۆکوانزی سەر دەریای ئەلبیرت لە نیوان ئۆگەنداو کۆنگۆ کە شوینیکی راوی ماسیە ،دوای ئەوەی لە سەرەتای ئەو سەدەیە نەوتی لیدۆزرایەوە بوە کیشەی هەردوو وولات ،چەند جاریك بوویتە شەڕ ، جزیرەی ئەبوموسا لە نیوان ئیمارات وئیران رووبەرەکەی نزیکەی 13کم ،ناوی جیاجیای فارسی وەرگرتوە لە میژوودا ،خەلکە رەسەنەکە پێی دەلین (گاپ سەبزە یان بام سەوزە —واتە سەوزایی) لە نەخشە کۆنەکان بە (بام ئاوی- واتە خاکیکی ئاوی) لەو دواییە بوە بام یان بۆموسا-خاکی موسا،لە عربیش بوە ئەبوموسا ، هەندێ جار بەهۆی چارەسەر نەبوونی (ناوچە ناکۆکەکان) بوویتە دەولەتێکی سەربەخۆ وەك ئەو کێشەیەی لەنێوان ئەرجەنتین وبەرازیل لە 1825ڕوویدا لەسەر ئۆرگوای وشەڕ ڕوویداو لەئاکامدا لە1828وارێکەوتن کە ئۆرگوای ببێتە دەولەتێکی سەربەخۆ،هندو پاکستانیش لە 1947 ئەوکێشەوشەڕەیان لە نێوان دروست بوو،بوە

هۆی دروست بوونی بەنگلادێش لە 1971،ئیستاش بیابانی رۆژئاوا لەنێوان جزائرو مەغریب ومۆریتانیا بەو ئارِستەیە دەڕوات، هەندێ ولاَتانی تریش ئەو کێشانەیان هەروا ماوە، لەوانە:ئەرمینیا لەگەل ئازەربیجان لەسەر ناگۆرنی کارەباخ، ئیمارات لەگەڵ سعودیەو لەگەڵ ئێران، لەنێوان ئیسرائیل و فەلەستین، لەنێوان یابان و چین، لەنێوان بەریتانیان و ئەرجەنتین (دورگەکانی فۆکلاند)،...**لە زۆر لای تریش .**

لە کاتی دارِشتنی سنور لەنێو ولاَتانی عەرەبی کێشەیەکی زۆری تر سەری هەلدا، چونکە زۆربەی ئەو سنورانەی بۆیان دیاری کراوە دەستکردەو بنەچەیەکی مێژوویی و یاسایی و سروشتی نیە،.. لەنێویشیاندا عێراق لە هەموان زیاتر ئەو کێشەیەی هەم لەگەڵ دەوروبەر و هەم لە ناوەخۆش هەیە، تا ئێستا بە چارەسەرنەکراوی بەجێ ماوە، ئەوەی لەسەر ئاستی نێو دەولەتی کەمێك بە کێشەی ناوچە جیناکۆکەکانی کوردستان دەچێ کێشەی( ئبیە) زۆر وێچووی کێشەی کەرکوکە ،ئەویش دانیشتوانی هەردولای تێدایە ونەوتاویەو لەنێوان هەرێمێکی فیدرالی و ناوەندە بەلاَم لەوێ تەعریب نەبوە ، هەروەها ناوچەی(سدتنلاند) نێوان ئەلمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا بوو، کەرِێکەوتنامەی (میونیخ)لێ مۆرکرالە30/سیپتمبر/ 1938، سدتلاند800هەزارچیکی و نزیکەی 3ملیۆن ئەلمانی لێبوو،برِیارِیاندا وەك برِیارِیکی نێودەولی(ئەلمانیاو فرنسا وئیتالیاچیکۆسلۆڤاکیا) کە بە راپرسی ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ لە چوارچێوەیمافی گەلان لەدیاری کردنی چارەنوسی خۆیان.

بەپێی (برگەی 2ی مادەی 1 وبرگەی 3ی مادەی 52ی میساقی نەتەوەیەکگرتوەکان چارەی ناوچە ناکۆکەکان بە راپرسی بوە،هەروەك لە نێوان چیك وئەلمانیا کرا، لە1949/5/11نەتەوەیەکگرتوەکان برِیارِی ژ273ی دەرکرد بۆدیاری کردنی سنورو بەرقەراری ئاشتی نێو دەولەتی، جا دەولەت بێت یان هەرێمی فیدرالی وئۆتۆنۆمی بێت.

لەدوای دروست بوونی عیراق لە 1921 هەر کاتێ دیاریکردنی (ئیقلیمی کوردستان)هاتبێتەپێش ئەوکێشەیەهەبوە لە: 1936 ،1958 ،1966، 1970،1974، 1983 ،1991،تادەرچوونی ، مادەی58لە(قانون اداره الانتقالیه-2004)،دوایش مادەی 140ی دەستوری ، لەسەرئاستی نێو

نەتەوەیش لە بڕیارِی ژ:1770ی ڕۆژی 2007/8/10 (دانیشتنی ژ: 5729)سەبارەت بەو ناوچەو دیاری کردنی (ستیڤان دیمستۆرا) وەك نوینەری نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ناوچە ناکۆکەکانی دەوروبەری کەرکوك.

ئەوەی کەمێك کیشەکەش سانا دەکات ئەوەیە خودی حکومەتی عیراق دانی بە بوونی تەعریب هێناوە بە شیوەی فەرمی،لەسەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکوردلەخالی(8)ی ریکەوتنامەی (11)ی ئاداری 1970(إعاده سكان القرى العربيه والكرديه الى اماكنهم السابقه..) ، هەروەها لەبڕگەی(ب)ی مادەی (58) (قانون اداره الدوله الإنتقاليه-2004ز) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب ودەستکاری سنوری ئیداری راشکاوانە تردەهێنی دژ بەکوردستان لەو ناوچەیە کراوە، لەسەر ئەو بنچینەش لیژنەیەك بۆ مادەی 140دەرچوە بەو شێوەیەی خوارەوە پیناس کراوە:

**لجنة تنفيذ المادة (140) من دستور جمهورية العراق، هي لجنة دستورية, تنفيذية, وزارية ,قانونية، شكلت بموجب الأمر الديواني المرقم (46) عدد (م ر ن/48 /1373) في (9 / 8 /2006 ) متضمنا تسمية رئيس اللجنة وأعضائها.**

پاساوی عروبی[608] و دەولەتی عیراقی :

بە ووردبوونەوە لە سەرجەم پاساوەکانیان ئەوەیە نالێن عربیە زیاترتەقەلایان ئەوەیە بڵێین کوردستانی نیە، بە کورت وپوختی ئەوەی خوارەوەیە:

دەڵێن ئەو ناوچانە عێراقین ، کەرکوك شارێکی کوردی نیە، زیاتر تورکمانی لێیە، عەرەب و ئاشوری و کەمایەتی تریشی لێیە، ئاواش باقی ناوچە ناکۆکەکان. دەلێن ئەوەتا کورد لە ئاماری 1957 (3\1)ی دانیشتوانی کەرکوك پێك دەهێنێ . هەندێکیشیان ڕاوی بەڵگەنامەی مێژووییان کردوە، هەندێ بەڵگەیان دەستگیر بووە، لەوانە:

---

[608] مەبەستمان لە عروبی ئەوانەی زیاد لە پێویست ناشیۆنالیزمن بەرامبەر میلەتانی برایان ، بۆ جیا کردنەوە لە میلەتی عەرەب ئەو زاراوەمان بەکارهێناوە.

(أ) دەڵێن لە سەردەمی عەباسی ئەو ناوچانە سەر بەغدا بوە.بەڵگەی بریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسل خودی تاپۆی عوسمانی(دائرە التسجیل العقاری) کە لە16/تشرین یەکەم/1908 دەرچوە دەردەکەوێ شارەزووریش سەر بە عیراق بوە .

(ب) لە رێکەوتنی شریف حسین بن علی لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی گەورە لە1915، ئەوا ئەو ناوچانە تا ئامێدی و دیاربەکر و نسیبینی وهێلی 39ی تیابووە.

(ج) لەسەردەمی عوسمانیش هەندێ جار ویلایەتی موسل سەر بەبەغدا بوە.

(د)هەندێ جار باس لەوەش دەکەن کە نەك ئەو ناوچانە، تەواوی ویلایەتی موسڵ لە کێشەکەی نێوان تورکیا و عێراق یاساییانە بە عێراق درا،.. ئیتر ئەو ناوچانەش بەشێکە لە ویلایەتی موسڵ و عێراقین.

بەشێکی تر پاگندەی ئەوە دەکەن کە لە سەردەمی مدحت پاشا ویلایەتی موسڵ خرایە سەر بەغداو ئیتر موڵکیەتی بەغدا بەسەر ئەو ناوچەیە یاساییە.

وەلامی کورد: ئەوان دەلین عیراقی بوونی کەرکوك وەك کوردستان لەدوای 1921 دیت ،بە مەرجیش بوە ، راپۆرتی ویلایەتی موسل ومەرجەکانی لکاندنی خواروی کوردستان بەعێراق کە بریتی بوو لە25 سالی تر ئینتداب و پێدانی مافی چارەنوس بە کورد لەو شوێنانەی زۆرایەتین.

لە سەردەمی عەباسی گوایە ئەو ناوچانە سەر بە عێراق بوونە، بەهۆی بەغدا.. لە ڕاستیدا وانیە لە سەردەمی عەباسی بەغدا پایتەختی عێراق نەبوە، بەڵکو پایتەختی عەباسی بووە، ئەگەر ئەوە پاساو بێت، ئەوا ئەنادۆڵ و شام و لبنان و ئیسرائیل و میسر و... هەمووی عێراق بووە، ئەوکات ویلایەتی عێراق هەبوە، بەڵام دواسنوری کەمێك سەروی سامەڕا بوو، ئەوکات ئەو ناوچانەی کەرکوك وموسل سەر بە ئیقلیمی جزیرەوویلایەتی شارەزوور بوون.سەبارەت بە ریکەوتنی (شەریف- ماکماهۆن) لە کتێبی(دور ملك فیصل..ص14) هاتوە: (ان ولایة موصل الی ماردین وکوردستان جنوبیة ضمن

اتفاق ماكماهون - شريف)، راستی رێكەوتنامەكەی شريف —ماكماهۆن لە هەردوو كتێبی:(الملل والنحل والأعراق ص226)و (فورستر-نشأه الدوله العراقيه ص72 ) هاتوه كە ئەوەی بەڵێن بە شريف دراوەلە 1915 راستيەكەی وانيە، چونكە لەدوای ئەو ڕێكەوتنە بە ساڵێك دابەشی رۆژهەڵاتی ناوەراست كرابە پێی سايكس پيكۆ ،تيايدا سنوری عيراق كەمێك سەرووی بەغدايە ،ويلايەتی موسل درا فرنسا كە لايەك نەبوە لە ڕێكەوتنامەكەی شريف ماكماهون. لەبارەی (كەركوك شارێكی كوردی پەتی) نيە.. بۆيە عێراقيە، لە راستيدا بە دەگمەن شارو وڵاتێك دەبينی بتوانرێ ناسنامەی ڕەگەزێكی دياريكراوی پێ بدرێ، لەو ڕووەوە كورد زيرەك بووە لە گەڵاڵەكردن و چارەسەركردنی ئەو خاڵە نەيان وتوە كەركوك و ناوچە ناكۆكەكان كوردين، بەڵكو وتويانە كوردستانيە، لەئاماری1957يش (لەگەل تەعريبيش)كەچی ئەوەئامارەكەيە: كورد48٫3٪ ،28٫2٪ عەرەب ،21٫5٪توركمان،نەك ئەوەی برايانی عەرەب دەڵێن كورد زۆرايەتی نەبوەو بە 3\1يان لە قەلەم داوە.لەبارەی بوونی توركمان ئەگەر هەريميكيان هەبوايە لە كركوك لە نەخشەی عوسمانی بەدی دەكرا...

زياتر لەوە بەشی زۆری رەوشەنبيرو ميژووناسانی كورد بەوە قايل نەبوون كە ئەو ناوچەيە ناوی ليبنرێ (ناوچە ناكۆكەكان) بەلكو دەلين دەبوايە بوو ووترێ (ناوچە كوردستانيەكانی جيئيداريە ناكۆكەكان) ،بەلگەی ميژوويی وجوگرافی و تۆپۆگرافی و .. دەخاتە ڕوو كە تەواوی ئەو ناوچە ناكۆكانە كوردستانيە ،كەلەبڕگەی داهاتوو نۆرەيتی .

**پاساوی كوردستانی بوون :**

دياری كردنی سنوری خواروی ناوچە جيناكۆكەكان (كە دەكاتە سنوری خوارووی كوردستان)بريتيە لە ساغ كردنەوەی ئەو كيشەيە زۆربەكورتی بەو شيوەيەی خوارەوە :

**1- سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەكان بەپێی گەڕيدەكان:**

گەڕيدەيەكی زۆر هاتونە ئەو ناوچەيەو چيان بينيوە نوسيويانە.. هەندێكيان ئيسلامين و ئەوانی تريش بيانين:

أ- گەڕیدەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوانە 1-ئیبن بەتوتە ئەو ناوچانەی بە دانیشتوی کورد وەسف کردوە لە کتێبێك بەناوی (تحفە النچار فی غرائب الامصار-ص208) وە دەڵێ کە سەردانی ئەسفەهانم کردلەڕێگە پڕبوو لە ڕەشماڵی ماڵە عشایرە کوردەکان 2- قلقشندی لە (نهایە الارب فی أنساب العرب) دەلیٚ کورد لە 20 شوێن هەن ،لەوانەش بلادکرخینی(کەرکوك) وداقوق[609] . 3-ابن حوقل (977ز) ،یاقوت حموی((1178)م)،ابن مهلهل،قزوینی ،أبو الفدا (732ك بەرامبەر1331ز) ،ابن فچل العمری ،ابن خلدون( 1406)ز، ئیستاخاری(-346ك بەرامبەر957ز). باسی کوردیان کردوە لەسەرووی جبل حمرین[610] بەڵام باسی عەرەب وتورکمانیان نەکردوە.

ب- **گەڕیدە بیانیەکان:** سەرەکیەکانیان تۆماردەکەین: لیوناردو رالف لە 1574،گەڕیدەیەکی فرنسی سالی 1696 –من ایران فکردستان )[611] ،**میرزا ابو طالب** -هندی (رحلات فی اسیاواوروباوافریقا-1779)، جاکسۆن لە کتێبی(مشاهدات بریطاني لمسیبوتامیا-1797)،ئۆریندۆپریەی فرنسی(رحلە من ایران-1807) ،جیمس بینگام (رحلات فی بلاد مابین النهرین-1816)، ج کیتیر-(رحلە اسیە الصغری وارمینیە وکردستان- لندن 1818) ، رۆبەرت کیربۆرتەر(رحلات فی جورجیا وایران وارمینیا-1818)،جیمس ریچ لە1820،ج شیل لە1836،کارل ریتەرلە 1844 ،مافرینز لە1892، تادەگاتە مارك سایکس(سفرەفی ولایات الخمسە الترکیە-1899)،فریزر-(رحلات الی کردستان ومابین النهرین لندن1840 ) فون هامری نەمساوی لە ( تاریخ الدولة العثمانیة ) پانیزەلە1911،مذکرات مسیودی فایریسین(من البلقان حتی برلین )،فورستر(نشأة الدولة العراقیة)،...ئەوانە هەموی سەردانی کەرکوکیان کردوە، کەسیان نەیوتوە کەکوك کوردستانی نیە یان ووتویانە کوردن یان باسی ناسنامەی نەتەوەییان نەکردوە .

---

[609] شهاب الدین الأعشی -(مسالك الأبصارفی ممالك الأمصار ج4ص373-)

[610] ابن خلدون لە (مقدمە ص74) .

[611] ئەو گەڕیدەیە لە کتیبی(لونکریك – اربعة قرون من تاریخ الراق الحدیث ص399)هاتوەو دەلیٚ ناوەکەی دیار نیە .

**2- کوردستانیەتی ئەو ناوچە بەپێی نەخشە کۆنەکان:**

ا- نەخشەی ئیبن حۆقل لە سەدەی 10، ئەلبیرۆنی ، خوارزمی، بنیامین بن حنا(1160-1173)زابو حسن بن سعید(1274ز...زۆری تر سەرووی بەغدایان بە(جزیرە)ناوزەد کردوە، خوارووی بەغدایان بەعیراق تۆمار کردوە، بەشێکیان سەرووی بەغدایان بەکوردستان یان بلاد الاکراد یان وەك(ابن حوقل بە مصایف الاکراد)تۆمارکردوە،هەرچی نەخشەی (**نصرالدین الطوسیة**) موسل و تەواوی ویلایەتی موسلی خستۆتە سەر ئیقلیمی جزیرەی کورد.

ب-لە هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی سالی 1893 و1896 کوردستان زۆر بەگەورەیی تۆمارکراوە وهەموئەوناوچە دابڕاوانەو موسل و خوارووی جبل حمرینیش دەگرێتەوە.

ج- لە نەخشەی کۆنی(محمدبن حسین الکاشغری703ز) لە (بلاد کاشغر) نزیك چین تیایدا(بلاد الاکراد)ی دیاری کردوە پێش 1300سال[612] لەو ناوچەیە.

**3- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە بەپێی مەعجەم و ئەنسکلۆپیدیەکان:**

أ- جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شمس الدین سامی لە (قاموس الاعلام) ،ئەولیا چەلەبی لە(سیاحتنامە)

ب- لە دائرە المعارف الإسلامیە[613] ، (جهان نماه )ی حاجی خلیفە جلبی 1732م باس لە سنوری کوردستان دەکا دەڵێ کوردستان لەهەرمزد(کەنداوی عەجەم-شەتولعەرەبی ئیستا)و مەلاتیە ڕا دەست پێ دەکا تا دەگاتە موسل وعیراقی عەجەمی . ،

**4- لەسەرچاوە عەرەبیەکانی هاوچەرخ :**

ا-سەرچاوەی گەورەی میسر بەناوی (الجغرافیاالسیاسیە)[614] دەڵێ کوردەکان لە کۆنەوە وولاتیان هەبوە پایتەختەکەی ئەرابخا(کەرکوکی ئیستا) بوە.

---

[612] ئەو نەخشەیە لە بەغدا لە(دیوان اللغات العثمانیة) دانرابوو –بروانە خولاصەیەکی تارخی کوردو کوردوستان لە پێشەکی راستکردنەوەکانی (محمدزکی بەگ )لەلایەن محمد جمیل رۆژبەیانی .

[613] دائرة المعارف الإسلامیة (باللغة الفرنسیة)، ج5 ص147.

ب- له (موسوعەالعالمیه العربیه) له (ماده: جبل حمرين)دەلێ (جبل حمرين) سنورێکی سروشتی نێوان کوردو عەرەبە.

ج-:قاموس السیاسی-احمد عطیةالله–لەبابەتی کوردستان ص968 شارەکانی کوردستان ڕیزکردوە کەرکوك سێیەمە .

## 5- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی:

ا-دائرةمعتمدالسامی البریطانی–البلادمابین النهرین A-8735بغداد1921/6/1..لەوڕاپۆرتە باس لە دیاریکردنی سنوری ئەو دەولەتەی بەناوی (عراق العربی)دەکا کەبریتانیا بەنیازە دروستی بکا ،دەڵێ شارەکانی کەرکوك وکەلاروکفری عەرەب نین ،بەڵام 100٪ کوردیش نین.

ج- **الوثائق السرية–بغداد 1929/4/23 من همفريز مندوب السامی البریطانی** ...لەو بەلگەنامەیە باسی بارو دۆخی کوردستان دەکا ودەڵێ بەشی زۆری دانیشتوانی کەرکوك کوردن .

**6- کوردستانیەتی ئەو ناوچە لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ**(تقريرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركی البریطانی حولةلاية الموصل) زؤر بة رِوونی لة ( ص223 ص219 ص218 ص159 ..هاتوە.

## 7- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە رێکەوتنە نێودەوڵەتیەکان:

ا-کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە ڕێکەوتنی بدلیسی سولتان: چڕکراو لە (5) مادە، لەگەل داگیرکردنەوەی بەغدالەلایەن عوسمانیەکان دیسان دەسەڵاتی کورد(ئەردەلان )گەڕایەوە تا نزیك بەغدا ،کەرکوك بوو بە مەلبەندیان لە شارەزور.

ب- لە رێکەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە1823/7/28بەسترا،پێکهاتوە لە (7) بەش- لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنوری دەگاتە نزیك بەغدا .

---

[614]عدد من الأساتذة المختصين- (الجوغرافياالسياسيةص458) سالی 1961 دەرچوە .

ج- سنوری خوارووی کوردستان لەمادەی 62ی سیڤەر، سنورەکە دیاری کراوە وبریتیە لە ڕۆژهەلاّتی فورات دیاری کراوە.

**8- کوردستانیەتی ئەو ناوچە بەپێی یاسایی:**

ب- وەك دەزانین وولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست بە پێی ڕێکەوتنی سیڤەر دروست بووینە،کەرکوك لەسەر میلاکی عێراق لە عوسمانلی جیانەبوەتەوە، ،واتە بەپێی مادەی94 ی ئەو ڕیکەوتنة جیانەبووە، بەڵکو کەرکوك لەسەر میلاکی کوردستان جیا کراوە بەپێی مادەی 62بوو مەلیك فەیسەل (مەلیکی عیراق)یش خۆی لەو کۆنگرە بەشدار بوو[615] .

**9 - کوردستانی ئەو ناوچە لەکاتی داگیرکردنی عیراق:**

بروسکەی چەرچل بۆ مەلیك فیصل:**(اننا وعدناك بتأسيس دولة عربية وليست امبراطورية، لذلك ان حدودك لن تتجاوز جبل حمرين الى ما ورائه فهو كوردستان)**[616]..

**10- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لەروی سایکۆلۆجیەوە:**

تا ئەو ساتە لە کاتە هەرە سەخت و شڵۆقەکان نە حکومەتی عێراقی نە بەعس نە شۆڤێنیەکانی ئێستا لەروی سایکۆلۆجیەوە بوێری ناکەن بڵێن ئەو ناوچەیە عەرەبیە، یان کوردستانی نیە، بەڵکو دەڵێن عێراقیە،لە مێژوودا یەك بەلگە نیە کێشە لەنێوان کوردو عەرەب هەبووبێت لەسەر ئەوناوچە یان لەبەلگەیەك هەبووبێت داوای ئەو ناوچەیان کردبێت یان حوکمیان لێ کردبێت .

هەندێ شارەزای تر دەلین باشترین بەلگەی کوردستانی بوونی ئەو ناوچەیە خودی تەعریب خۆیەتی .

---

[615] بروانە: دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر- سلام ناوخۆش ، مسعودعبدالخالق

[616] الإسلام والعلمانية واثرهما فی النشأة الدولة العراقية ص218

(20)

## **سیستەمی سازان** – النظام التوافقی Harmonic system

**ئەوانەش دەگرێتەوە (هەماهەنگی سروشتی، دیموکراسی تەوافقی، دەوڵەتی پێکهاتە، هاوڵاتی بوون،(قانون اقلیه الحدیدی)،** ئسنۆ سەنتریالیزم، **کۆتا)...**

ئەو زاراوەیە بەشێوە فلسفیەکەی کۆنە بەلام بەشێوە سیاسی ویاسایيەکەی نوێیە ،ڕیشەکەی دەگەڕیتەوە بۆسەرهەلڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن ، کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوتنی ویستیڤالیای 1648 ، بەلام لە دوای جەنگی جیهانی دوەم هاتە واری جیبەجیکردن ، زۆر پەیوەندی دارە بە زاراوەی (دیموکراسی سازانی-**دیمقراطیة التوافقية**) هەردووکیان بۆ ئەو دەوڵەتانە بەکاردێت کە فرە پێکهاتەن و لەنەتەوە و ڕەگەز و تایەفەی جیا و لەناو دەوڵەتەکە نەتواینەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە بگونجێن بە پێی ڕێژەی بوونیان لەو وولاتە دەسەلاتەکان لەسەروو تا خواروو دابەش دەکریت ،ئەوپرۆسەیە پێی دەووتریت سیستەمی سازان (**النظام التوافقی**) بە ئینگلیزیەکەی ( Harmonic system ) هەرچی (الموسوعه الميسره) بە (Reconciliation system) ناو بردوە[617] ، هەرچی (الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية) بە (**الديمقراطية الاتفاقية** – concordant democracy )ی ناوبردوە[618] لە شوینیکی تر بە (التعاقدی) ناوزەدی کردوە، هەرچی Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts(**المعجم الحديث للتحليل السياسي**) بە(**ديمقراطية المجتمعات المتعددة**) ناوی بردوە[619]،زۆر جاریش بە دیموکراسی دابەشکراو (sub-dimucracy) ناوزەد دەکرێت،موسوعە لالاند بە(بە هارمۆنیکی )بەکارهێناوە ،بەلای فلسفیدا چوە بەمانای سازانی زەمانی وزەمینی ...، سیستەمیکی زۆر سەرکەوتوو نیە پرۆسەو گۆڕانەکان لێی سستن ،بەلام ناچاریە تازۆرایەتی زال نەبێت بەسەر کەمایەتی ،جۆرە هاوسەنگیەکی ڕێژەیی دەدات ،نزیکە لەسیستەمی

---

[617] الموسوعه الميسرة ص455 .

[618] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية) ص211

[619] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts-P95

کۆتا دەتوانین بلێین کۆتا سازانی بچوکەو سازانیش کۆتایەکی فراوانە ،کەمیك جیاوازی لە گەل فیدرالی وکۆنفیدرالی هەیە ،لەنێوان هەردوولایە ، لەگەل شراکەش جیایە .

پیناسی جیاجیای نیە ،سیستەمیکی دیارە ،بۆیە پیناسی (موسوعەی لالاند ) کورتی کردۆتەوە بە فلسفیانە لەوەی کە هیچ بەشیك لەگەل بەشەکانی تر ناکۆك نەبیت ..(**وةك مبدا عدم التناقض**) ، لەشوێنیکی تر بەرامبەر زاراوەی فرنسی( harmonie) سازانی داناوە ،لە فلسفە وەکلە(موسوعەی لالاند) پیناسی هاتوە: هەمولایەك کۆك بن یان وەك رینیە پواییە دەلیٚ مانای(**قابلة للارضاء**)...

<u>**فەلسەفەی سازان:**</u> سازان چەمکیکی فراوان ترە لە دۆخیکی کۆمەلایەتی بەلکو سەرانسەری بوونەوەر وسروشت دەگریتەوە ،لە ڕووی زانستیەوە جاریکی تر (کیپلەر) ووتی ئەو گەردونەی ئیمە بە سیستەمی سازان بە ڕێوە دەچیٚ هەموی لەگەل هەموی سازاوە نەك ناکۆك ،هەر یاسای سێیەمی کیپلەر(پەیوەندی نێوان دووری وخیرایی ئەستێرە لەناوەند) بەناوی (سازانە-harmonie ) ، بۆیەش لەلای زانایان (لەوانە نیوتن) کاروبارو سازانی گەردوون وەك کاری کاتژمێر وەسف کراوە ،هەر بەش وپارچەیەك ئەوەی تر تەواو دەکات ، نەك ڕێگری وناکۆکی ،جیاوازی لەگەل سازانی سیاسی ئەوەیە لەکۆمەلگە لەنێوان چەندسەرکردەیەك دێتەدی وپیکدیٚ،ئەوە مانای سازان دەدا ،هەرچی سازانی گەردوونیە ڕەنگە مانای هەماهەنگی هەلگریٚ نەك سازان ،چونکەلەبوونەوەر لەلایەن چەندخوایەك سازان نەکراوەو گەردوون وبوونەوەر دابەش بکەن ،بەلکویەك خوا ئەو سازانەی لە نێوان بەشەکانی گەردوون هەماهەنگ کردوە ،وەك (موسوعەی لالاند ) دەلێت هیچ بەشیکی سروشت لەگەل بەشەکانی تر ناکۆك نەبێت ، هەمولایەك کۆك بن لە هەرزەمان ومەکانیك[620] ، بەو شێوە ئەو بوونەوەرە بریتی نیە لە فەوزای سەرتاسەری،لە کاری عەبەسی وبێئامانج،بەلکوهەماهەنگی سەرتاسەری هەیە بۆ هێنانەدی مەبەست وپەیامە گەورەکان،هەروەك ئەکزیۆمی پینجەمی ئیکلیدس بەناوی (مبدأعدم التناقظ-consistenc ) هاتوە،یان جار وایە پیٚی دەلێن (یاسای گشتی هەماهەنگی - Law of Non-Contradiction / Loi de Non-Contradiction / - قانون

---

[620] موسوعە لالاندالفلسفیە ج1ص491وص494 .

**عدم التناقض)** دەقەکەی لەخوارەوەیە [621]،هەرچی بۆچوونی مارکسیەو لەپێش ئەویش هیگل وچەند فەیلەسوفیکی تریش پێیان وابوو ئەو بوونەوەرو سروشتە تیکڕای لە ناکۆکی توند دان ، سیستەمی تێدا نیە زیاتر عەبەسیە ،لەبەر لەنگی ئەو بۆچوونە ستالین لە کتیبەکەی(المادیە الدیالکتیکیە والمادیە التاریخیە) لە جیاتی یاسای سێیەم(نفی النفی) یاسای (إلتحام العام)ی دانا زیاتر لە گەلالەی فلسفی ئاینی(هەماهەنگی بوونەوەر) نزیك دەبیتەوە ،کە هەرمانای سازان دەدات.

ڕەنگە ئەرستۆ کە چۆن بنەمای (عدم التناقف)ی بۆ گەردوون وسروشت داڕشتوە ،هەرئەویش لەپێش هەموان بیری لە سیاسەتی سازان کردبێتەوە وەك چارە بۆ پەڕەگری ،نەك هەر بۆسیاسەت بۆ دەولەمەندی وهەژاری بۆ بەرژەوەندی تایبەتی وگشتی ..تا دەگاتە ئاین وسیاسەت وپیکەوەژیان وزۆرایەتی وکەمایەتی .

## هۆکاروپاساوی ئەو سیستەمە

دوای سەرکەوتنی دیموکراسی لە جیهانی نویدا ، وەسفی گەیشتە ئەو رادەی بلێن (دەرمانی هەمو دەردان)[622] ،کەچی دەبینین وانیە ،ئەویش کۆمەلێك دەردی خۆی هەیە (کە لەمەوسوعەی جودی بەشی یەکەم )باسمان کردوە، تەنانەت پەڕەگریشی تێدایە وەك ئەرستۆ ناوی لێناوە (دیموکراسی پەڕەگر-EXTREME Democrasy )[623]، ،ئیستا باسی بەشیکی گرنگی تری نەگونجان وبێچارەیی دیموکراسی دەکەین کەبەهۆیەوە چەمکی (سیستەمی سازان) و(دیموکراسی تەوافوقی) پێی سەری

---

[621] قانون منطقي لا تكون بمقتضاه القضيتان( أ أو لا أ أنظر النفي) صادقتين في الوقت نفسه وجاءت الصياغة الألى لقانون عدم التناقض على يد أرسطو .ويمكن صياغة هذا القانون على النحو التالي:
القضية أ لا يمكن أن يتكون كاذبة وصادقة في آن واحد .وهو بالكتابة الرمزية :أ .أ حَيث (.) هي علاقة العطف .والخط فوق الرموز هو علامة النفي .ويلعب قانون عدم التناقض دورا هاما في التفكير والمعرفة .وتصبح الاحكام أو النظريات العلمية غير متماسكة عندما تحتوي على تناقضات صورية.
وقانون عدم التناقض هو انعكاس في العقل للتحدد الكيفي للأشياء، أي للحقيقة البسيطة القائلة بأنه إذا أمكن استخراج تجريد من تغير ما في الشيء نفسه، فإنه لا يمكن أن يتصف في الآن نفسه بصفات تستبعد كل منها الأخرى - (موسوعة الماركسية) .

[622] مام جلال –راپۆرتی کۆنگرەی یەکەمی (ی ن ك) ئەو دەلی دەرمانی هەمو دەردانە .

[623] ثرۆفیسۆر زکریا بشیر امام – التنویر والحضارة ص53

هەلدا، بۆچارەی کیشەی فرە نەتەوەو پیکهاتە ،بەتایبەتی لەو وولاتانەی هیشتا لە قۆناغی (دەولەتی پیکهاتەیین)،کە بە دیموکراسی ئاسایی چارە نەدەبوو بە ئاسایی ، لە دەولەتی پیکهاتە هەر تاکێك هاولاّتی راستەوخۆ لە دەولّەتەکە نیە ، بەلّکو ئینتیمای یەکەمی بۆ پێکهاتە و ڕەگەز و نەتەوەکەیەتی، ئینجا بۆ دەولّەت، واتە هەر تاکێك ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری یاسا و ڕەوشی سیاسی دەولّەت نیە، بەلّکو لەرِێ ی پێکهاتەکەی خۆی کارلێك دەکا لەگەلّ دەولّەتەکە، بەو جۆرە دەولّەتانە ناوترێ دەولّەتی هاولاّتی، بەلّکو پێ ی دەوترێ دەولّەتی پێکهاتە ، (ئەرنت لیپهارت) یەکەم کەس بوو ئەو تیبینیەی بە قوولی کرد لە کتیبیك بەناوی (**الديمقراطية التوافقية فی مجتمع متعدد**) باسی (سیستەمی تەوافقی)کردوە بۆ بەرجەستەی کۆمەلگەی فرە لایەن دژ بە دیکتاتۆری زۆرایەتی، لە(مەوسوعەی لالاند)باسی (راڤیسۆن) دەکا وەك یەکەم کەس زاراوەی سازانی لەسەر ئاستی سروشتی داهێناوە [624]، لیبهارت تیبینی ئەوەی کرد لەو وولاتانەی هیشتا پەیوەستن بە هۆکارە ستونیەکان وئینتمای نەتەوەیی نەتوایتەوە لە نیو وولات ،واتە ئینتمای یەکەمیان بۆ نەتەوەو پیکهاتەکانیانە نەك دەولەت، لە ڕەوشی ئاوا نەتەوەیی زۆرینە لە هەلبژاردنی دیموکراسی دەسەلاتەکی ڕەهای دەست دەکەوێ ونەتەوە بچوکەکان بێبەش دەبن ، ئەوە یەکێکە لە خەلەلە گەورەکانی خودی دیموکراسی ، بەلکوخراتر لەوەش بەرەو دیکتاتۆری وتاکڕەویش دەڕوات ڕێسایەك لەلایەن (ڕۆبیرت مایکل) لە 1912 دارِژرا دەلیّ لەوبارودۆخە یەکەم جار دەسەلات بەزۆرایەتی دەرێت، بەڕەوتی سروشتی بەرە بەرە لە زۆرایەتی وبۆ کەمایەتی لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك لە چەند کەسێك بۆ تاکە کەس وئیتر کارەسات ودیکتاتۆری وناکۆکی،ئەو ڕێسایە پێی ووتوە (قانون اقليه الحديدى) [625].

لە (موسوعە الميسرە) ناوی ناوە (القانون الحديدى للاوليكاركيه-iron law of oligarchy) دەلی بە سروشتی بەشەری کارەکان لە بەکۆمەلەوە بەرەو کەمایەتی ولەویش بۆ تاکە کەس دەچێت[626]،لەوەوە فلسفەی دەست گۆڕی دەسەلات هاتتە کایەوە ، لەوەی لیبهارت هەولیداوە ئەو دەست گۆڕیەی دەسەلات لەناویەك پیکهاتە قەتیس نەمێنێ ، پێیوایە سێ ئەگەرو سێچارەسەریش هەیە لە پیش

---

[624] موسوعه لالاند ج1ص494 ص544.

[625] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts 226-p

[626] موسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية–جزء(ق) ص32

دۆخی وا هەیە :1-تواندنەوەی ئەو پیکهاتانە لە نێو دەولەت بەهاوسەنگی وبێئەوەی لایەك زال بکەیت بەسەر لاکانی تر 2- دابەش کردن ودانی مافی چارەنوس بە نەتەوەو پیکهاتەکانی تر بۆخۆیان دەولەتی سەربەخۆیان هەبێت 3-دان هێنان بەو جیاوازیانەوپیدانی ئەو چارەسەریە کە بەناوی سیستەمی سازانەیی[627] ،لەوەوە لیبهارت ئەو سیسستەمەی گەلالەکرد .

هەر لەسەرئەو بنچینەیە دەرکەوت کە دیموکراسی کیشەی نەتەوەیی پێ چارەسەر ناکرێ ،وەك پیشوو تر بانگەشەی وای بۆ دەکرا ،هەر لەتەوەری کێشەی نیشتمانی دەبینین نموونەیەکی ئێجگار زۆر لە جیهاندا هەیە کەدیموکراسیەو کێشەی نەتەوەیی هەیە ،ئەو وولاتانەی خوارەوە هەر یەکە بەجۆرێك دیموکراسی پەیڕەو دەکەن و کەچی کێشەی نەتەوەییشیان هەیە: ( ئیسپانیا – باسك ) (مکسیك – زابات) (ئیسرائیل – فەلەستین) (هند – کشمیر) (تورکیا – کورد) ( بەریتانیا – ئێرلەندا) ( سریلانکا – تامیل)...هتد ، ڕەنگە جار جار بلێین ئەوە تەواو دیموکراسی نیە بۆیە چارەسەر نەبووە ، نمونەی ئەزمونی عیراق وکوردستان،زیاتر لەوەش تورکیاو کورد ، پرپەتی لە وەلامی ئەو جۆرە پرسیارانە ، ئەو وولاتانەی فرە رەگەزو پیکهاتەن و بەلام دەولەتەکەیان بەهۆی (بنەمای هاوولاتی بوون)ئەو پیکهاتەورەگەزانەی لەناو دەولەت تواندیتەوە ئەو کیشەیەی نیە ، لەسەر ئەو بنچینە قوولەو بۆ ئەوەی زۆرایەتی زال نەبیت بەسەر کەمایەتی وکیشە ئەسنی دروست نەبیت ،کە ریشەیەکی کۆنی هەیە بە ناوی جیاجیای وەك (اپنیە ،اقوامیە،مشکلە الاقلیاتـ ..ئیپنۆلۆجی) کەیەکەم جار زانای سویسری(شاڤال) لەسالی 1787ز زاراوەی (ئیسنی) بۆ ئەو کیشە داتاشی، تا سیستەمی سازان نەهاتە دی بەتەواوی کیشەی ئیسنی چارەسەر نەبوو ،بەهۆیەوە ، ئەو سیستەمەی هینادی .

<u>ئەزموونی وولاتان:</u> قۆناغیکی سەختە بەشیکی زۆری وولاتان بەو قۆناغە تیپەڕینە ،لەسەردەمی نوێ زیاتر سیستەمی چیکۆسلۆفاکیاو قوبرس ولبنان وئیمارات وعیراق بە (سیستەمی سازان) هەژماردەکرێن ، ئەو دیموکراسیە تایبەتیەی لە سیستەمی سازان پەیرەو دەکرێ ، پیی دەوتری (دیموکراسی سازان-**الدیموقراطیة التوافقیة**). سەرەتای زۆربەی دەولەتان بەو قۆناغە رۆیشتن ومادام

---

[627] لیبهارت–الدیمقراطیة التوافقیة ص75.

زۆربەیان فرەنەتەوەو پیکهاتەن، بەهۆی سەروەری یاسا و دەست گۆڕی دەسەلآت و دینامیکیەتی دیموکراسی بەخێرایی وەرچەرخاون لەدەوڵەتی پێکهاتە بۆ دەوڵەتی هاولآتی بوون، لەوانەبلجیکیا،هولندا،سویسرا،النمسا.[628]، دەتوانین بلێین ئەزمونی دروست بوونی ئەمریکا سەرەتا لە 1771سازان بوە وەك لە نامەکانی هاملتۆن بۆ ویلایەتەکان دەردەکەوێ لە نێوان کۆنفدرالی وسازان ئەوەی دوەم کرا ناوەڕۆك ، بوە هۆی ئەوەی کۆنفیدرالیەکەی ئەمریکی وەرچەرخێ بۆ سیستەمی فیدرالی لە 1787بەو پێیەش ناوەکەی بوە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، **ئەوەی** سویسراش 33سالی خایاند، ئەوەی ئەلمانیالەگەل نەمساولە سەدەی 19 و ئەوەی سربیاو مونتینیگرۆو لە کۆتایی سەدەی بیستەم، کۆنفیدرالیە عەرەبەکانیش لەناواڕاستی سەدەی بیستەم سەرکەوتوو نەبوو ،لەبەر ئەوەی ڕەهەندی نەتەوەییان لێ زالە نەتوانراوە سیستەمی سازان پەیڕەو بکەن، تا ڕادەیەك دەتوانین بلێین ئەو کۆنفدرالیەی بکەوتبوایە دۆخی سازان سەرکەوتو دەبوو بۆ یەکگرتن ئەگینا لیکهەلدەوەشانەوە ، هەندێکی تر نەیان توانیەوە بپەڕنەوەهیشتا لە قۆناغی ئەزمونی سازانن، لەوانە:( چیکۆسلۆڤاکیا، قوبرس، لوبنان، عێراق ، تاڕادەیەك(بە جۆرێکی تر) ئیماراتی عەرەبی)،جیکۆ سلۆڤاکیا لێك جیابوونەوە ،باقیەکەی تر ئێستا لە جیهان بەوە بەناوبانگن کە سیستەمی سیاسیان تەوافقیە، هەندێکیان بە دەستوریانە هەندێکیشیان بێ دەستوری، لوبنان بەبی دەستوریە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ( **الميثاق الوطني - 1943**) لەنیوان هەردوو فراکسیۆنی مەسیحی بەسەرۆکایەتی (بشار خولی )و موسولمان بەسەرۆکایەتی (ریاز سولح) بەوشیوەیەی خواروە : 1- لبنان عربی بیت بەلام بە گیانیکی رۆژئاوایی 2-سەرۆك کۆمار مسیحیەکی مارۆنی بیت .3-سەرۆك وەزیران موسولمانی سونە بیت .سەرۆکی پەرلەمان شیعەی موسولمان ، سوپا سالاری گشتی مارۆنی وەزیری دەرەوە مسیحی ئەرسەدۆکسی ،وزیری بەرگری دورزی ، کەچی لە قوبرس و چیکۆسلۆڤاکیا دەستوری بو لەو شێوەیەیەی خوارەوە : چیکۆسلۆڤاکیا لە 14ی نۆڤەمبەری 1918 پیکهات لەدوومیلەتی جیای چیك وسلاڤ بە سەرۆکایەتی (تۆماس مازاریك)، 66٪ی چیك و28٪سلۆڤاك وکەمایەتی تریش، قوبرسیش بە پێی دەستوری 1959 تەوافوقیانە رێك کەوتن لە

---

[628]- بروانة: ارنت ليبهارت –الديمقراطية التوافقية فى المجتمع متعدد ص12.

سەر بنچینەی ڕێژەی پێکهاتەیی، بە جۆرێك 60٪کبرسی یۆنانی وباقیەکەی تر تورك وکەمایەتی ترن سەرۆك کۆمار یۆنانی جیگری تورك، 35پەرلەمانتار یۆنانی و 15 تورکی ، 7 بە 3 وەزیریش، .. لبنان وئیماراتیش ئاوا دابەشکراوە، عادەتەن لەو جۆرە سیستەمی پەرلەمانی دەبێت نەك سەرۆکایەتی .

ڕەخنەی هەرە گەورە لەو شێوازە حوکمە ئەوەیە هەنگاوو گەشەی ستتە ،بەلام دەبینین هاوتای ئەویش یۆگوسلاڤیایەکەپیکهاتبوو لە(سرب وکروات وبۆسنو مۆنتینگرۆ..) شکستی هێنابە شێوە مەرکەزی بیٚ ڕێکەوتن وتەوافوقی بوو لەدوای (تیتۆ) هەڵوەشایەوە .

**میکانیزمی دابەشی:** دەسەلات:لەسەرەتای پەیڕەو کردنی سیستەمی (تەوافوقی) بنکەی فراوانتر بوە ،سازان بوە لە نێوان پانتایی سیاسی وئاینی ونیشتمانی وچینایەتی ،لەسەردەمی ئیستا ئەو بنکەیە تەسك بوویتە بۆ نیشتمانی (تایفی وئاینی ونەتەوەیی) سیاسی وچینایەتی لیٚ چارەسەر بوە، بەدەگمەن لە جیهان سیستەمیکی سیاسی ماوە لەسەر بنچینەی سیاسی تەنها لە کوردستان لە نێوان دووحزب(پارتی ویەکێتی) کە ئەویش بەرەو کۆتایی هاتنە ,

ئیستا سیستەمی باو بۆ دابەشی دەسەلات ئەوەیە چەند حزبێك دەکەونە کێبڕکێی هەلبژاردنێکی سەرانسەری وولات و سەرەنجامەکەی دەبێتە تەرازووی دابەشی دەسەلات ،ئەو پرۆسەیە زۆر سەرکەوتوە بۆ ئەو وولاتانەی پیکهاتەو نەتەوەو تایفەکان لە چەمکی هاوولاتی تواینەوە ،بەلام بۆ ئەو وولاتانەی هیشتا دەولەتی پیکهاتەن(نەك دەولەتی هاوولاتی)،یان جار وایە لە پۆلی دەولەتی (مرکبة-etat-compos)دەژمیررێن، بە پیچەوانەی ئەودەولەتانەی لە یەك رەگەزی و مەرکەزیانە پێك هاتوون پێیان دەلێن دەولەتی سادە : etat-simple، لەوەی یەکەمابەدیموکراسی ڕاستەوخۆ دابەشی دەسەلات لاسەنگ دەبێت ، دەبێتە هۆی سەرکەوتنی پێکهاتەیەك بەسەر پێکهاتەیەکی تر نمونەی هەلبژاردنەکانی عیراق لەدوای 2003 هەر ئەو ڕاستیەی دووبارەدەکردەوە ،لە نێو هەر سیٚ پێکهاتە زۆرایەتی شیعە زۆرایەتی دەنگ دەهێنیٚ، زۆر لە زانایان بیریان لەوە دەکردەوە کە وولاتانی پێکهاتە ناکریٚ دیموکراسی بکرێتە بنچینە بۆ دابەشکردنی پۆست، پێکهاتەو کەمایەتیەکە بیٚ بەش

دەبو، هەر لەوەش بیرۆکەی کۆتا سەری هەڵدا، کە ڕێژەیەکی خێرپێکردن لەدەرەوەی پرۆسەی دیموکراسی بۆ ئەوانە دابندرێ کە بەشدارن و دەنگیشیان کەمە، بەڵام (کۆتا) بۆ کەمایەتیە زۆر کەم چارەبو، بۆ ئەوانەی دوو نەتەوە یان دوو تایفەی هاوسەنگ یان بنچینە هاوسەنگ نەدەبوو، لەسەر ئەو بنچینە سیستەمی دیموکراسی تەوافقی داهێنرا، کە بریتیە لەو پرۆسەیەی کە لەناو پێکهاتەیەك بە دیموکراسیانە منافس لەسەر ئەو بەش و پۆستانە بکرێ کە بۆیان دانراوە و بەتەوافقی لەسەری ڕێکەوتن، واتە دیموکراسی دابەش بکرێت(sub-dimucracy) هەریەکە لە چوارچێوەی ئەو پشکەی بۆی دانراوە کیبڕکێ ی هەلبژاردنی لەسەر بکەن نەك لەسەر ئاستی هەمو وولات ،نمونەی قوبرسی یۆنانیەکان وەرگرین: تورکەکان ناچنە هەلبژاردن لەسەر ئاستی هەمو قوبرس کە سەرجەم ژمارەی پەرلەمانتارانیان 50کەسە ،نە یۆنانیەکانیش بەلکو هەریەکە لەسەر ئاستی پیکهاتەکەیان کە بریتیە لە 15 بۆ تورك و35 بۆ یۆنانی ،واتە تورکەکان دەچنە هەلبژاردن کیبڕکێ لەگەل یۆنانیەکان ناکەن بەلکو لەگەل چەند حزبێکی تورکی لەسەر ئەو 15 کورسیە دەکەن، بەهەمان شێوە یۆنانیەکانیش بۆ ئەو 35 کورسیە کە چەسپاوەبۆهەر پیکهاتەیەك ، نمونەیلبنان و عیراق بە جۆرێکی ترە ،بەو ڕاشکاوە دەستوریەی قوبرس وچیکۆسلۆڤاکیا نەهاتون بەلام دابەشی دەسەلاتەکە وایە ،لبنان سەرۆك کۆمار مسیحی وسەرۆك وەزیران سونەو سەرۆکی پەرلەمان شیعی ،لە عیراق سەرۆك کۆمار کورد،سەرۆکی وەزیران شیعەوسەرۆکی پەرلەمان سونە .

نمونەی پیشوو تری دوای جەنگی جیهانی دوەم هەریەکەلە سویسراو نەمسا فراوانتر بوو سازانی سیاسی وئاینی ونیشتمانی وچینایەتیشی دەگرتەوە ، لە سویسرا یەکیتی فیدرالیەکەیان لە 1959پیك هاتبوو لە 7حزبی سەرەکی لە شیوەی سیاسی وئاینی وچینایەتی(دوو ئەندام لە رادیکالیەکان ،ئەندامیك لە سۆشیالیستەکان،دوو لە کاتۆلیك،یەکیش لە جوتیاران )،لە نەمسا لە 1966زیاتر تەوافوقەکە ئاینی وسیاسی بوو ئەندامەکانی بە هاوسەنگی وسازان لە نیّوان کاتۆلیك وسۆشیالیستەکان بوە .

ماوە بلیین حکومەتی تەوافوقی و ئیئتلافی و حکومەتی بنکە فراوان وحکومەتی یەکڕێزی و حکومەتی (شەراکە) ...هەموی لیّك جیان ، حکومەتی تەوافوقی وگۆڕانکاریەکانی ستونیانە

لەسەروو تا خواروو ، بە پێچەوانەی حکومەتی ئیئتلافی ئەگەر هەر گۆڕانێك بێتە دی ئەوا تەنها ئاسۆییانە لە کابینەی ئەنجومەنی وەزیران ڕوودەدات ،شۆڕ نابێتە خوارەوە ،کەچی لە حکومەتی تەوافوقی هەر گۆڕانکاریەك بێتە دی بە هەر هۆیەك بێت (تەوافوقیانە بێت یان بە ئەنجامی هەلبژاردن بێت) ئەوا لە کابینەو باقی دام ودەزگاکانی خواروو تریش ڕوودەدات ،تەنانەت دەپەڕێتەوە بۆ دەسەلاتەکانی تری وەك پەرلەمان ودادگاو سوپا وپۆلیس و ئاسایش ، بۆیە بە ڕای هەندێ زانای سیاسی ویاسایی حکومەتی تەوافوقی بەتەنها نایەتە دی دەبێ تەواوی سیستەمی سیاسی ویاسایی و ئیداری وبەرگری لەسەسەر بنچینەی تەوافوقی بێت[629] ، لە بڕگەی داهاتووی سیستەمی سیاسی هەریمی کوردستان زیاتر ئەو چەمکە ڕوون دەبێتەوە .

**سیفەت وتایبەتمەندیەکانی** : لە کتیبەکەی (ئەرنست لیبهارت)و دوایش لە ئەزمونەکانیان چەند نیشانەو سیفاتی تایبەت بەو سیستەمە هەیە لەوانی تر نیە، بەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە: 1- دام ودەزگاکان بە پێی ڕێژەی دانیشتوانی پیکهاتەکان پڕ دەکریتەوە ،پێی دەووترێ (**تمثيل النسبى**) 2- بوونی فیتۆ بۆ لایەنەکانی پێکهێنەری سیستەمی سیاسی وولات 3- دابەشی دەسەلات ونوێنەرایەتی هەر لە ئاستی کابینەو سەروو قەتیس نامێنی ،شۆڕ دەبیتەوە ئاستەکانی تری خوارووش 4- سەربەخۆییەکی نیسبی بۆ هەدوولا لە ناوچەکانی خۆیان 5- هەمولایەکان بەشداری حکومەت دەبن بە فراوانی ناوی جیاجیای بە هەلە گرتوە ،لەوان:حکومەتی بنکە فراوان ،شەراکە،ئینقازی نیشتمانی ،..بەلام ئەوەی چەسپاوە معارەزە لەو سیستەمە نیە .

ئەو سیستەمە زۆر سستە ئەزمونێکی سەرکەوتوو نیە لە جیهان بەلأم ناچاریە،وولاتانی ئەو جۆرە دووڕێگەیان گرتە بەر یەکەمیان ئەو دەولەتانەی دام ودەزگاو دەستوریان وا داڕشت کە دەولەتی هاوولاتی(یان دەولەتی نیشتمانی) دروست بکەن ئەوا پەڕینەوە لەسیستەمی تەوافوقی ، ئەو وولاتانەش کە دام ودەزگاو دەستورو جۆری حوکمیان نەتەوەیی وستونی بوە ئەوا ناتوانن پیکهاتەو

[629] بۆ لێك جیاکردنەوەی ئیئتلاف لەگەلێ تەوافوق بڕوانە :ارنت ليبهارت–الديمقراطية التوافقية فى المجتمع المتعدد ص47–

نەتەوەكان لە دەولەت بتوێننەوە وەك لە ئەزمونی یەكەم ، لەوەی یەكەم كە ئەزمونی ئەوروپا و ئاسیاو زۆربەی وولاتانی جیهانە نەیان ویستوە میلەتێك لەناو میلەتێك بتوینریتەوە، بەلكو ویستویانە هەمو میلەت و پیكهاتەكان لە بەرژەوەندی هاوبەش ویەكسان لە نێو دەولەتەكە بتوێننەوە(یان لێك نزیك بكەنەوە) ،ئەزمونی جیهانی عەرەبی وتوركی ویستویەتی میلەت وپیكهاتەی بچوك تر لەنێو میلەتی زۆرایەتی عەرەب بتوێنیتەوە (نەك لەنێو دەولەت ) بۆ ئەو مەبەستە پەنای بۆ پاكتاوی ڕەگەزی و تەعریب بردوە،زیاتر بەلای پیكهاتەی كەمینە بە داگیر كەر دەچێ نەك خۆ وولاتی ، بەشی لە وولات ودەستورو دام ودەزگاكان پەراوێزیە ،لە سەردەمی عوسمانی نەتەوەو پیكهاتەو كەمایەتی جیای تێدابوو (سەرەڕای سەلبیاتی زۆریش) كەچی تارادەیەكی چاك پێكەوە ژیان هەبوو ،ڕەگەزێك بەسەر ڕەگەزێكی تر فەزل نەكرابوو ،لە دەستوری عوسمانی(مەشروتیە) كە پێك هاتبوو لە 119 مادە و 4368 ووشە بەیەك ووشەش ناوی توركی تیا نەهاتوە[630]،بە پێی مادەی(71)ی دەستوری عوسمانی (مەشروتیە) ئەوا نوینەر(مەبعوس) نوینەرایەتی هەمومیللەتان دەكا نەك هەر بازنەكەی خۆی، كەچی دوای لە دەستوری توركیای نوێ لە مادەی (66)ی بە ئەدریسی (تورك فەتەنلەر)وادەلیت هەرچی لە توركیا بێت توركە لە دەستوری توركیای نوێ( ANA YASA)لە مادەكانی 64 تا 68 تەنها نەتەوەی توركی تیا تۆماركرا،دەقی مادەی 66ئاوادەلی:

## Türk vatandaşlığı

MADDE 66. – Türk Devletine vatandaşlık bağı ile bağlı olan herkes Türktür. Türk babanın veya Türk ananın çocuğu Türktür. (Son cümle mülga: 3.10.2001 ـ 4709/23 md Vatandaşlık، kanunun gösterdiği şartlarla kazanılır ve ancak kanunda belirtilen hallerde kaybedilir. Hiçbir Türk، vatana bağlılıkla bağdaşmayan bir eylemde bulunmadıkça vatandaşlıktan çıkarılamaz. Vatandaşlıktan çıkarma ile ilgili karar ve işlemlere karşı yargı yolu kapatılamaz[631].

كەواتە كورد یان عەرەب یان لاز چی بكەن ،پێیان دەلێن دەبێ لەناو توركیا بن وتوركیش بن ئەگینا ئەوەتە زیندانی و سزاو تۆپ و فڕۆكە،هەلبەتە سەرەنجامێكی لۆژیكیە شۆڕش و بەرگری كورد لەوێ

---

[630] بڕوانە دەقی یەكەم دەستوری عوسمانی دەرچووی 24/12/1876 .

[631] بڕوانە: siyasi rehber بەشی ana yasa دەقی دەستوری هەمواركراو بە بڕیاڕی ژ:2709ی 7-11-1982 لە ل3 هوە تۆماركردوە

دروست بێت ، ئەگەر دروست نەبێت ئەو میلەتە مردوەو  لە پلەی ( ظالمی انفس) ، بە هەمان شێوەو خراتر لە دەستوری وولاتانی عربی ، لە دەستوری سوریاش1970 و، 1973: المادة الأولى ..القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي،لەو دەستورە 59جار ووشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەكجاریش ناوی كوردی تیا نەهاتوە،تەنانەت فلستین ژێردەستیشە كەچی لە مادەی (1)دەستوریان تۆماریان كردوە كە فلستین بەشێكە لە نیشتمانی عەرەبی !!المادة 1: فلسطين جزء من الوطن العربي الكبير، والشعب العربي الفلسطيني جزء من الامة العربية والوحدة العربية هدف يعمل الشعب الفلسطيني من اجل تحقيقه ، دةستوری عيَراق 1968: المادة الأولى: .. الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها..)،لە دەولەتی ئەلمانیاش كاتێ مادەی (4)ی پەیڕەوی ناوەخۆی حزبی نازی  پەیڕەو دەكرا بوە جینۆسایدی نەتەوەو ئاینی تر .

ئەو نەریتە یاسایی وسیاسیە گەیشتۆتە ناوەڕكی حزبەكانی پێكهاتەی گەورە ،نمونەی حزبی بەعس لە مادەی 7ی دەستوری حزبی بەعس نكولی لە بوونی پیكهاتەو كەمایەتی تر دەكاو هاتوە :الوطن العربي هو هذه البقعة من الارض التي تسكنها الامة العربية .لةمادةى  (15) :- الرابطة القومية هي الرابطة الوحيدة القائمة في الدولة العربية التي تكفل الانسجام بين المواطنين وانصهارهم في بوتقة واحدة، وتكافح سائر العصبيات المذهبية والطائفية والقبلية والعرقية والاقليمية،  لەوەوە دروشمی (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة) هاتوە ...كەواتە بەو شێوەیەناكرێ چەند گەلێك لەناویەك دەولەت بژین ،مادام ئەو دەولەتانەی پرانسێپی (هاولاتی بوون) لەدەستورو دام و دەزگاكان بەرجەستە نەكات، جاریش وایە بە گۆتە دانی پیا دەنێ لەڕاستیدا ئەوە بەرجەستەی تیۆری (گراهام سمنەر)ە لەبارەی كۆبونەوە لەدەوری ڕەگەز كە پێی دەووترێت (ئسنۆ سەنتریالیزم) .

لە ئەنجامی ئەو سیستەمە ڕەگەز پەرستیە بەلایەن كەمەوە یەكسانی لە نێو هاوولاتی دروست نابێت بەلكو هاوولاتی پلە یەك ودوو دروست دەبێت  ،چارەسەری سێیەم ئەوەیە مادام دەولەت نەیتوانیە بگاتە ئاستی هاوولاتی یەكسان بوون ئەوا سیستەمی تەوافوقی پەیڕەو بكەیت .

**<u>سیستەمی سازان ودۆزی کورد</u>:** لەبەر ئەوەی کورد لەوولاتی خۆی زۆرایەتی ڕەها بوە کەمتر بەو ئەزمونە تێپەڕیوە ،مەگەر ئەو پرۆژەیەی روسیا کەمیك نزیك بێت لەو سیستەمە جۆرێك لە سازانی(کوردی وتورکی وئەرمەنی )لە پرۆژەکەی روسیاش بەدی دەکریت کەمێك پیش جەنگی جیهانی یەکەم بۆ ولایەتەکانی (ئەرزەرۆم-وان-خەرپووت – پەتلیس – ئامەد – سیواس )، کەلەمادەی یەکی لائیحەی (پرۆژەی چاکسازی روسی-22مادەیی) بەناوی (پرۆژەی پورتقالی ژ:50) ،ئەو پرۆژەیەی روسی لە1913/6/8 بۆ چاکسازی باری ئەرمەنی لە وولاتی عوسمانی جاڕدرا، پیکهاتبوو لە 22مادە ،لەمادەی (5)ژمارەی ئەرمەن وموسولمان لەئەنجومەنی ویلایەت یەکسان بن ، لەمادەی (15) داکۆکی لەوە دەکا هەر فەرمان وبەیانێك بەهەر(3)زمانی (ئەرمەنی وکوردی وتورکی)بێت[632] ،دوای بەشێك لەو چاکسازیە بوە ڕێکەوتنێکی روسی وعوسمانی بە مۆری(سعیدحلیم پاشای سەدری ئەعزەم وسەرکۆنسۆلی روسی (گۆلگڤیتچ) لەرۆژی 26/کانونیدووەمی 1914 .

لە جیهانی عەرەبی وتورکی سیستەمی سازان پەیڕەو نەکراوە لە ژێر دروشمی درۆینەی برایەتی میلەتان ، سەرچاوەی کێشەکان لێرەیە ، واتە کیشەکە لەدەولەت سەرچاوە دەگرێ نەك لە هۆکاری تری وەك پیلانی ئیستعمارو زایۆنی و ...، تەنانەت کە دەگوترێ (مشكلة الأقليات) یان (مشكله الكورديه) هەلەیە ..(مشكله) خودی دەولەتەکەیە ، وەك ئیستا دەبینین لە عیراق جاران هەر دەووترا (المشكلة الكوردية) ئیستا (المشكلة السنية ) و(المشكلة الطائفية) .. کەواتە خودی دەولەتی عیراق (مشكلەیە) ..کیشە لە سیستەمە لە دەستورە لە سوپاو دەسەلات ودادگاو هەموە ،مادام بە پێی تەوافوق دابەش نەکراوە ، بۆیە وولاتانی عربی وتورکی زۆربەی کێشەیان لەگەل غەیرە عەرەب و غەیرە تورك هەیە،تەنانەت ڕاست کردنەوەی ئەو نەخشەیەی ئیمپریالیزم نەبو کەبۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاستیان دیزاین کردبوو، دروست کردنی برایەتی و بنەمای هاوولاتی بوون نەبوو، وەك لە وولاتانی ئەورووپی لە نێوان کۆمەلیك میللەت وپێکهاتە هەیە،لیرەوەوەلامی ئەو پرسیارە مێژووییە کە دەلێن بۆچی نەتەوەی جیا لە وولاتانی ئەورووپا شۆرش وپشێوی نانێتەوە کەچی لە جیهانی عەرەبی وئیسلامی وهەندێکی رۆژهەلاتیش وادەکەن ..کەواتە دەستی ئیستعمارە..، ئەوە هەلاتنە لەوەلامە

---

[632] روسیا –کۆنسۆلخانەی ئەستەمبۆل- (الكتاب البرتقالي رقم 50) ناوزەد دەکرا .

ڕاستەقینەکە کە ئەو سیستەمە پەیڕەو نەکراوە ،مانای وانیە هەتا هەتایە ئەو سیستەمە وابێت بەلکو وەك ئەوروپا بۆ قۆناغێکی (ئینتقالیە) .

لەلای کوردیش دوای نیو سەدە لە دروشمی حزبە کوردستانیەکان (دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) وەك زامنکەری کێشەی کورد هەڵگرتبوو، گەلێ جار وای بۆ چوونە عیراقێکی دیموکراسی بێ ئۆتۆنۆمی و فیدراڵیش هەر زامن کەری مافی کوردە ، کەچی بەسەرنجێکی ئەزمونانە وادەرناکەوێ، ئەگەر دیموکراسیەکی راستەقینەو هەلبژاردنیکی دروست کرا، واتە پشت بەمەبدەئی دەنگی زۆرایەتی بەسترا ئەوا گومانی تێدا نیە هەرگیز نەتەوەی سەر دەست دەنگ ناداتە نەتەوەی ژێر دەست بۆ شەراکەو ئەو ڕێژەیەی پیویستە پێیان بدریت یان بەگشتی بۆ چارەی خۆ نوسین( جا چ لامەرکەزی بێت یان ئۆتۆنۆمیەو فیدڕالی هەتا سەربەخۆیش ) ، لەگەڵ ئەو هەموو ئیجابیاتەی دیموکراسی و بەراورد لەگەڵ دیکتاتۆری هەر ناکرێ ، .کەچی هەلە دەرچوو دیموکراسی چارەسەری کیشەی نەتەوەیی پێناکرێ ،بەلکو هەمان دیزاینت پێدەداتەوە ، بەو شیوەیە دروشمی لە میژینەی حزبە کوردستانیەکان (دیموکراسی بۆ عیراق..) چارە نەبوو ، وا پیدەچی بە ووردی ئاگایان لەوە نەبوو لە پال دیموکراسی سیستەمی دیموکراسی تەوافوقیش هەیەگونجاوە بۆ بارودۆخی عیراق و تەواوی دۆزی کوردستان، هەر لەیەکەم حزبی کوردیەوە ( حزب التعالی والترقی الکورد 1908 ) تاحزبە کودستانیەکانی ئێستا بە ووردی ئاگایان لەلێك جیاکردنەوەی دیموکراسی ودیموکراسی تەوافوقی و سیستەمی ئیئتلافی وسیستەمی تەوافوقی نەبوە ،تا لەدوای 2003ەوە ئینجا بۆ یەکەم جار بەتەواوی هەستیان پێکرد کە دروشمی (دیموکراسی بۆ عیراق )بەتەنها زامنی مافی میلەتانی تر نیەو چەمکی (تەوافوقی) هاتە کایەوە ،ئەوەندە بەتوندی هاتە کایەوە بوە بنچینەی سیستەمی سیاسی کوردستانیش! ، بە گشتی لە جیهانیش لەو کۆمەلە ئەنجامە بیرۆکەی دیموکراسی تەوافوقی وسیستەمی تەوافوقی هاتە کایەوە .

کەواتە پرسیاری بنچینەیی ئاخۆ مافی میلەتان و میلەتی کورد بە دیموکراسیەکی سەرتاسەری وولاتەکە دێتەدی یان دیموکراسیەکی تەوافوقی لە چوارچیوەی سیستەمیکی تەوافوقی ؟

زۆر ئاساییه لەلای دەولەتی عیراقی چارەی کێشه وچارەنوسی نەتەوایەتی کورد بەپێی مەبادیئی دیموکراسی دەگێڕنەوه بۆ هەموو خەڵکی عیراق ، لەلای کوردستانیشیان بەڵگەی سەلمێنراومان هەیه کەڕای زۆرایەتی و ڕای ڕێکخراوه مەدەنیەکانییان سەلبی بووه لەسەر کێشەی کورد، وەسفیان بە( جیاوازی خواز ، تێکدەر ، کرێ گرته ، یاخی، دژی دیموکراسی ، سەر بە ئیمپڕیالیزم ، سەهیۆنیەت ، تیرۆریست ، دژی یاسا، دژی مەدەنیەت .......هتد) ، ئیتر چۆن دەنگی زۆرایەتی دێت بدەنه کوردستان بۆ شەراکه یان هەر مافیکی سیاسی ویاسایی، کەواته ئەو دیموکراسیه دیسان نەتەوەی کورد ژێر دەخاتەوه هەر وەك له بەشی کوردستانی سەروو هەر زمانیشی لێ قەدەغه کردوون، بۆیه لەلای ئاڕستەی سیاسی نوێی کورد دەلین ماف لەدەست خۆمانه دیاری بکەین نەك یەکێکی تر بۆمان دیاری بکات ، دەلین هەموو جیهان هەر وابوەپرسی میلەتەکان لەناو یەك وولات ناکەوێته دەست هەموو وولاّتەکه ،تەنیا ئەو نەتەوەهەقی دەنگ دانی هەیه بۆ چارەنووسی خۆی ئەوەتا له ئەریتیریا ، له تەیمور ، له وولاّتەکانی بەلقان ، له یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.....هتد ، ئەگەر پرس به هەمووئەسیوبیا بکرایه هەرگیز سەربەخۆیی به ئەریتیریا نەدەبەخشی ، ئینجا مەرجیش نیه هەموو ( راپرسیەك ) هەر داوای جیا بوونەوەیان کردبێت ، زیاتر دەکەوێته سەر جۆرو ناوەڕۆکی دەستوورو فەرمان ڕەواییەکەی ، له ساڵی 1999 له هەرێمی (کبك) له کەنەدا تەنیا راپرسیەکه لەو هەرێمه کرا ( نەك له هەموو کەنەدا) کەچی بەسەر بەستی خۆیانبه ریژەی 51٪ داوای مانەوەیان کردو جیا نەبوونەوە، به هەمان شیوه سکۆتلەندا لەسالی 2014 لەگەل بریتانیا، بۆیه دەبێ ئیختیاری شێوەی پەیوەندی هەرێم به مەرکەزەوه تەنیا له لایەن خەڵکی کوردستانەوه به کوردو تورکمان و ئاشوریەوه دیاری بکریت ، نەك هەموو عیراق وەك هەندێ له لایەنه عیراقی سوورن لەسەری .

جارێکی تر ئەزمونی وولاتان دەبێته سەرمەشق بۆ چارەسەری کێشەی پیکهاته جیاجیاکان ، ئەو وولاتانەی بەخێرایی توانیان دەوڵەتیان له سیستەمی تەوافقی گواستەوه بۆ سیستەمی هاولاّتی بوون ئەوا دەوڵەتیان سەرکەوتوو بوه، هەرچی یۆکۆسلۆڤاکیا و قوبرسه دابەش بوون، لوبنانیش هەردەم لەقەیرانه، نمونەی دەوڵەتی عێراقیش هەوڵیدا به ئاگر و ئاسن کورد و پێکهاتەکانی تر لەناو

پێکهاتەی گەورەی (عەرەب) بتوێنێتەوە، هەوڵیدا پێکهاتەی (شیعە) بتوێنێتەوە، گەورەترین کارەساتی دروست کرد، ئەو هەڵنەستا وەك وڵاتانی ئەوروپی وڵاتانی تری سەرکەوتوو هەموو پێکهاتەکان لەناو دەوڵەت بتوێنێتەوە و بنەمای هاوڵاتی بوون بەرپابکات، بەڵکو ویستی کورد لەناو عەرەب بتوێنێتەوە و ناسنامەیەکی عەرەبی بداتە دەوڵەت،ئەو کارەش بەدەستوریانە کراوە (وەك لەسەروو پیشان درا)، هەروەها دەوڵەتی تورکیا بەهەمان شێوە بە دەستوریانە و خودی جمو جۆڵی یاسایی و سیاسی وو خزمەتگوزاری و فێرکردن لەسەر ئەوە بوە میللەتانی تر لەناو تورك بتوێنێتەوە، لەوەوە شەرعیەتی ئایینی و یاسای دەولی بە بزوتنەوەی ڕزگاری خوازەکان دراوە، شەرعیەتی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد هەرلەچوارچێوەی مافی چارەنووس نیە بەڵکو لە چوارچێوەی بەرگری لە خۆکردن لەتوانەوە، بۆ ئەو جۆرە وڵاتانەش پێویستی بە سیستەمی تەوافقی و دیموکراسی تەوافقی هەیە.

ئەوەی سەروو سازانی دیموکراسی بوو ،هەرچی پەیوەستیشە بە سازانی پیکهاتەکانە بۆ چارەنووسی عیراق، بەر لەهەر بیرکردنەوەیەك دەبی (لامەکەزی) بێت ، تا ئیستا هەرێمەکانی فیدڕالیش تەنیا لەسەر بنچینەی کوردو عەرەب بوە ، ئەوەیان دیسان زیندووکردنەوەی نەخشەی کۆمەڵایەتیەکەراستەقینە نیە ،کەکورد هەر زەرەری بووە لەوەتەی دروست بوونی عیراق لەساڵی 1921 بریتی بوە : 23٪ کورد بووە لە 2٪ کەمایەتیەکانی ترو لە 75٪ عەرەب ، بەڵام ئێستا نەخشەی راستەقینەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی عیراق تەنها کوردو عەرەب نیە ،پیکهاتەی تر هەیە ، واتە بە دوو جۆری ئاسۆیی وستونی دابەشی هەیە ،بەم شێوەیەیە : 22٪ کورد لە 2٪ کەمایەتیەکان لە 55٪ شیعە لە 23٪ سوننە[633] ،واتە چارەی راستەقینە ئەوەیە عیراق بکرێتەوە سێ هەرێمی فیدرالی نەك دوو هەرێم .

---

[633] دوو تیبینی لەو دابەشیە ،یەکەم تا ئیستا بە ووردی ئامار نیە هەموی بە نزیکەیی قەبلینراوە ،دوەم وادەردەکەوی ریژەکە لە سەدا زیادی کردوە هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەریتەوە (هاوبەش) هەیە ،کوردهەیە شیعەیە ، تورکمانیش هەیە شیعەیە ،کاتی هەردوو تەوەری ستونی (نەتەوەیی) وئاسۆیی(مەزهەبی) کۆدەکەیەوە ریژەکە زیاد دەکا.

چارەنووسی عیراق لە مەترسی نیە لە ژێر ئەو دۆخە وەك وا بانگیشە دەکرێ ،ئەکەویتە سەر هەلس وکەوتی عیراق خۆی ،ئەگەر وەك ئەوروپا لە سەر بنچینەی هاولاتی ئیشی کرد ئەوا دیموکراسی تەوافوقیەکە وەردەچەرخێتە دیموکراسی راستەقینە(نۆرمال)،ئەگەر وەك وولاتانی عەرەبیش پالیان دا عروبەو ئەندام بوون لە جامیعەی عربی و لە دەستور باس لە نەتەوەی عەرەبی وناسنامەی عربی بکری ئەوە لە بەرامبەر نەتەوەکانی تریش داوای ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان دەکەن ،ئەو کاتیش هەر پیویست بە دیموکراسی تەوافوقی دەبیت ،یان ئەوەتا لەسەرتاسەری وولاتانی عەرەبی کیشە دەبیت وەك دەبینین لەگەل بەربەر،دارفۆری ،قبتی ،کورد،مسیحی لبنان وسودان ،لەگەل هەموان .لە عیراقیش بەو ئارستەیە یان تەوافوقی یان کیشە ،بۆیە لەپیشدا دەبی دان بە تایفیەت ورەگەزی عیراق بهینریت ،جیگەی داخە بەو ئارستەیە کار ناکری لە لایەن کوردیشەوە ،بۆیە هەروا عیراق لە شکست وکیشەوە بەرەو شکست وکیشەیەکی تر دەڕوا ، لە ژێر ئەو بارەی عیراق تا کیشەیەك چارەسەر دەکریت دووی نوی سەرهەلدەدا ،خەریکە تیۆرەکەی مالتۆس لەبارەی پەیوەندی (زیادبوونی دانیشتوان وداهات )پەیڕەو نەبیت بەلام بۆ پەیوەندی (کیشەو چارەلە عیراق) پەیرەو ببیت ،بە جۆریك کیشەکان بە (متوالیەی ئەندازەیی)سەرهەلدەدا کەچی چارەسەریەکان بە (متوالیەی حیسابی) دەکریت ،بەو شیوەیە کیشە لە عیراق بەو سیستەمە تەواو نابیت .

(21)

## جینوسایدی ئەرمەن اباده ارمن armanGenocide

ئەوانەش دەگریتەوە (جینۆساید،ئیتحادوتەرەقی،جەنگی جیهانی، پادسلافیزم، ئەنوەر پاشا،تەلعەت پاشا،جمال پاشا، کرییڤ،کتاب الازرق،قەرە فاتیمە،زاهی ، تۆبڕینەوە..)

هەمو سالی لە 24نیسان ئەرمەنیەکان ڕەشپۆش وغەمباردەبن ویادی کوشتارێك دەکەنەوە بەناوی جینۆساید دژیان کراوە لەسالی 1915ز ئەو رۆژە لەهەمو رۆژەکان ڕەش تر بوە بوە یادی سالانەیان .

لە مێژووداکوشتنی بەکۆمەڵ بێ لێك جیاکردنەوەی شەڕکەر لەگەڵ مەدەنی و مرۆڤ و ئاژەڵ پێی وتراو تەڕووشك سوتاندن نزیکە لە مانای (جینۆساید)، زاراوەی جینۆساید لاتینیە بەمانای قڕکردن دێت، بە ئەرمەنی، Հայոց Ցեղասպանություն بە تورکی(Ermeni Soykırımı،چۆن دەرمان لە هەندێ میش ومەگەز دەدریت بەبێ جیاوازی ودەسپاراستن،بە ئەفریقی (زاهی)پێووتراوە بەمانای تەرت و وێران کردن ، بڕیارەکە ئەوەیە کۆیان بکوژی،بۆیە جاروایە کۆکوژیشی پێدەووتریت، لە کوردستانی خۆمان باس لە (تۆ بڕینەوە)کراوە کە بەشیکە لە جینۆسایدی بچوك، یەکەم جار پاریزەرەی پۆلەندی(رافایل لەمکین 1900–1959) زاراوەی جینۆسایدی داهێنا بۆ ئەو کوشتوبڕەی بە پالنەری ئاینی ورەگەزی ومەزهەبی کراوە، لە دوو ووشە پیکهاتوە (geno–) بە یۆنانی مانای (کۆ)دێت کۆی عەشیرەت یان سەرجەلە،ووشەی دوەم (cide-) واتە کوژی، نزیکە لەکۆکوژی ، (موسوعە المعرفە)بە (ابادە) یان(محرقە)ی گوزارش کردوە،هەرچی(الموسوعة الميسرة للمصطلحات..)بە (الجنس يقتل) وەرگیڕاوە لە ئینگلیزیەکەی (men genocide)[634] ،لەکۆنەوە لە چوارچیوەی زولمی بەشەری زۆر جار بەکارهاتوە لەسەر ئاستی فراوان وتەسك ، بەلام دوای ئەوەی تکنۆلۆجیای چەك گەشەی کردو چەکی ئۆتۆماتیکی و دوایش چەکی کۆکوژی پەیدا بوو، ئەو زاراوە

---

[634] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص10

زەق تر بۆوە لەگەل کۆکوژی ئەرمەن لەلای تورك وهندیەسورەکان لەلای سپیە ئەمریکیەکان و هۆلۆکۆستی یەهودی تا دەگاتە ئەنفالی کوردستان.

یەکەم جار پرسی ئەرمەنی وستەمەکانیان لە کۆنگرەی (سان ستیفانۆ)تەقەلای بەدەولی بوونی درا ،دوای جەنگی روسی وعوسمانی (1877-1878)هەردوولالە لە سانستیفانۆ ودوایش لە برلین لە 1878ریکەوتن لە مادەی 16 و61 باس لە کوشتاری ئەرمەنی (خولی یەکەمی کوشتارەکە )کرا ، ،زۆربەی ڕێکخراوە نیودەولەتیەکان دانیان بە جینۆسایدی ئەرمەن هێناوە ،لەوانە :نەتەوە یەکگرتوەکان،پەرلەمانی ئەوروپی،ئەنجومەنی کنیسەکانی جیهان،مافی مرۆڤ،..،چەندین بڕیارو ڕێکەوتنامەی نیودەولەتی دەرچوە دژ بە جینۆسایدوهەژمارکردنی وەك تاوانی نیودەولەتی، لەوانە بڕیارِی ژ:260ی خولی(3)ی کۆمەلەی گشتی لە 9-12- 1948 لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان جارِدرا(دەقەکەی لە خوارەوەیە) [635] لەسالی 1951 کەوتە واری جیبەجیّ کردن، ودوای نزیکە

---

[635] **اتفاقية منع جريمة الإبادة الجماعية والمعاقبة عليها – 09-12-1948 معاهدات**

أقرت وعرضت للتوقيع وللتصديق أو للانضمام بقرار الجمعية العامة 260 ألف (د-3) المؤرخ في 9 كانون الأول /ديسمبر 1948
تاريخ بدء النفاذ: 12 كانون الثاني / يناير 1951، طبقاً للمادة الثالثة عشرة

إن الأطراف المتعاقدة:

إذ ترى أن الجمعية العامة للأمم المتحدة، بقرارها 96 (د – 1) المؤرخ في 11 كانون الأول / ديسمبر 1946، قد أعلنت أن الإبادة الجماعية جريمة بمقتضى القانون الدولي، تتعارض مع روح الأمم المتحدة وأهدافها ويدينها العالم المتمدن.

وإذ تعترف بأن الإبادة الجماعية قد ألحقت، في جميع عصور التاريخ، خسائر جسيمة بالإنسانية، وإيماناً منها بأن تحرير البشرية من مثل هذه الآفة البغيضة يتطلب التعاون الدولي. تتفق على ما يلي:

المـادة الأولى : تصادق الأطراف المتعاقدة على الإبادة الجماعية، سواء ارتكبت في أيام السلم أو أثناء الحرب، هي جريمة بمقتضى القانون الدولي، وتتعهد بمنعها والمعاقبة عليها.

المـادة الثانية: في هذه الاتفاقية، تعني الإبادة الجماعية أياً من الأفعال التالية، المرتكبة على قصد التدمير الكلي أو الج زئي لجماعة قومية أو إثنية أو عنصرية أو دينية، بصفتها هذه:

)أ ) قتل أعضاء من الجماعة.

)ب) إلحاق أذى جسدي أو روحي خطير بأعضاء من الجماعة.

)ج) إخضاع الجماعة، عمداً، لظروف معيشية يراد بها تدميرها المادي كلياً أو جزئياً.

)د) فرض تدابير تستهدف الحؤول دون إنجاب الأطفال داخل الجماعة.

)هـ) نقل أطفال من الجماعة، عنوة، إلى جماعة أخرى.

المــادة الثالثة: يعاقب على الأفعال التالية:

)أ ) الإبادة الجماعية.

)ب) التآمر على ارتكاب الإبادة الجماعية.

)ج) التحريض المباشر والعلني على ارتكاب الإبادة الجماعية.

)د) محاولة ارتكاب الإبادة الجماعية.

)هـ) الاشتراك في الإبادة الجماعية.

المــادة الرابعة: يعاقب مرتكبو الإبادة الجماعية أو أي من الأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة، سواء كانوا حكاماً دستوريين أو موظفين عامين أو أفراداً.

المــادة الخامسة : يتعهد الأطراف المتعاقدون بأن يتخذوا، كلٌ طبقاً لدستوره، التدابير التشريعية اللازمة لضمان إنفاذ أحكام هذه الاتفاقية، وعلى وجه الخصوص النص على عقوبات جنائية ناجعة تنزل بمرتكبي الإبادة الجماعية أو أي من الأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة.

المــادة السادسة: يتحاكم الأشخاص المتهمون بارتكاب الإبادة الجماعية أو أي من الأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة أمام محكمة مختصة من محاكم الدولة التي ارتكب الفعل على أرضها، أو أمام محكمة جزائية دو لية تكون ذات اختصاص إزاء من يكون من الأطراف المتعاقدة قد اعترف بولايتها.

المــادة السابعة: لا تعتبر الإبادة الجماعية والأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة جرائم سياسية على صعيد تسليم المجرمين، وتتعهد الأطراف المتعاقدة في مثل هذه الحالات بتلبية طلب التسليم وفقاً لقوانينها ومعاهداتها النافذة المفعول.

المــادة الثامنة: لأي من الأطراف المتعاقدة أن يطلب إلى أجهزة الأمم المتحدة المختصة أن تتخذ، طبقاً لميثاق الأمم المتحدة، ما تراه مناسباً من التدابير لمنع وقمع أفعال الإبادة الجماعية أو أي من الأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة.

المــادة التاسعة: تعرض على محكمة العدل الدولية، بناءً على طلب أي من الأطراف المتنازعة، النزاعات التي تنشأ بين الأطراف المتعاقدة بشأن تفسير أو تطبيق أو تنفيذ هذه الاتفاقية، بما في ذلك النزاعات المتصلة بمسئولية دولة ما عن إبادة جماعية أو عن أي من الأفعال الأخرى المذكورة في المادة الثالثة.

المــادة العاشرة: تحمل هذه الاتفاقية، التي تتساوى في الحجية نصوصها بالأسبانية والإنكليزية والروسية والصينية والفرنسية، تاريخ 9 كانون الأول / ديسمبر 1948.

المــادة الحادية عشرة: تكون هذه الاتفاقية حتى 31 كانون الأول / ديسمبر 1949، متاحة للتوقيع باسم أية دولة من الدول الأعضاء في الأمم المتحدة وأية دولة غير عضو تكون الجمعية العامة قد وجهت إليها دعوة للتوقيع. وهذه الاتفاقية واجبة التصديق، وتودع صكوك التصديق لدى الأمين العام للأمم المتحدة.

وبعد اليوم الأول من شهر كانون الثاني / يناير 1950 يمكن الانضمام إلى هذه الاتفاقية باسم أية دولة عضو في الأمم المتحدة وأية دولة غير عضو تلقت الدعوة المشار إليها أعلاه. وتودع صكوك الانضمام لدى الأمين العام للأمم المتحدة.

المــادة الثانية عشرة: لأي طرف متعاقد في أي حين، أن يجعل انطباق هذه الاتفاقية يشمل جميع الأقاليم التي يكون الطرف المتعاقد المذكور مسئولاً عن تسيير علاقاتها الخارجية، أو يشمل أياً من هذه الأقاليم، وذلك بإشعار يوجهه إلى الأمين العام للأمم المتحدة.

المــادة الثالثة عشرة: في اليوم الذي يكون قد تم فيه إيداع صكوك التصديق أو الانضمام العشرين الأولى، يحرر الأمين العام محضراً بذلك ويرسل نسخة منه إلى كل دولة عضو في الأمم المتحدة وإلى كل من الدول غير الأعضاء المشار إليها في المادة 11.

ويبدأ نفاذ هذه الاتفاقية في اليوم التسعين الذي يلي تاريخ إيداع الصك العشرين من صكوك التصديق والانضمام.

وأي تصديق أو انضمام يقع بعد اليوم المذكور يصبح نافذاً في اليوم التسعين الذي يلي تاريخ إيداع صك التصديق والانضمام.

المــادة الرابعة عشرة: تكون هذه الاتفاقية نافذة المفعول لفترة عشر سنوات تبدأ من تاريخ بدء نفاذها.

وتظل بعد ذلك نافذة المفعول لفترات متعاقبة تمتد كل منها خمس سنوات إزاء الأطراف المتعاقدين الذين لا يكونون قد انسحبوا منها قبل انقضاء الفترة بستة أشهر على الأقل. ويقع الانسحاب بإشعار خطي يوجه إلى الأمين العام للأمم الم تحدة.

100 وولات مۆریان لەسەر کرد، بریاری تری لە 26تشرینی دوەم 1968، بریاری دادگای لاهای رۆژی 28ئایار 1951 و..، لەو سەردەمە زۆربەی چەکە نوێکان کۆکوژن نەك هەر کیمیایی و چەکی بایۆلۆژیو ناوەکیو هایدرۆجینیو ..هتد ،لە رووی فلسفیەوە جینۆساید لەوە دیت کە پیکەوە ژیانی فرەیی نەگونجی ،وەك مەوسوعەی (Stanford Encyclopedia of Philosophy ) نمونەی بە جینۆسایدی هندیە سورەکان بە ژن ومندالەوە هیناوەتەوە ،لەبارەی پیناسی ئەوەندە بۆچوونی جیا لەو بارەیەوە نیە بۆیە چەند پیناسیکی کەم هەلدەبژیرین :

+قاموس النبأ : جینۆساید بریتیە لە ویران کردنی تەواوی توخمیکی بەشەری یان بە بەشیکیان بە هۆی دەمارگیری رەگەزی یان ئاینی یان بە پالنەری ئیستعماری[636] .

+ (الموسوعە العربیە): پیناسەکەی جیایە قەتیسی ناکا بە رەگەزو نەژادیك ، دژ بە نەتەوەو توخمیك نیە چونکەپەتی نیەتیکەلە،دەیەوێ بلی جینۆساید ئەوەیە تەرِ ووشك بسوتینی[637] .

---

المــادة الخامسة عشرة: إذا حدث، كنتيجة للانسحابات، أن هبط عدد الأطراف في هذه الاتفاقية إلى أقل من ستة عشر، ينقضي نفاذ مفعول هذه الاتفاقية ابتداءً من تاريخ بدء نفاذ آخر هذه الانسحابات.

المــادة السادسة عشرة: لأي طرف متعاقد أن يتقدم في أي حين بطلب تنقيح هذه الاتفاقية وذلك بإشعار خطي يوجهه إلى الأمين العام.

و تتولى الجمعية العامة البت في الخطوات التي قد يلزم اتخاذها بصدد مثل هذا الطلب.

المــادة السابعة عشرة: يقوم الأمين العام للأمم المتحدة بإبلاغ جميع الدول الأعضاء والدول غير الأعضاء المشار إليها في المادة الحادية عشرة بما يلي:

)أ ) التوقيعات والتصديقات والانضمامات المتلقاة طبقاً للمادة الحادية عشرة.

)ب) الإشعارات المتلقاة طبقاً للمادة الثانية عشرة.

)ج) تاريخ بدء نفاذ مفعول هذه الاتفاقية طبقاً للمادة الثالثة عشرة.

)د) الانسحابات المتلقاة طبقاً للمادة الرابعة عشرة.

)هـ) فسخ الاتفاقية طبقاً للمادة الخامسة عشرة.

)و ) الإشعارات المتلقاة طبقاً للمادة السادسة عشرة.

المــادة الثامنة عشرة: يودع أصل هذه الاتفاقية في محفوظات الأمم المتحدة.

وترسل نسخة مصدقة من هذه الاتفاقية إلى كل من الدول الأعضاء في الأمم المتحدة وإلى كل من الدول غير الأعضاء المشار إليها في المادة الحادية عشرة.

المــادة التاسعة عشرة: يقوم الأمين العام للأمم المتحدة بتسجيل هذه الاتفاقية في التاريخ الذي يبدأ نفاذها فيه.

[636]قاموس النبأ- المصطلحات السياسية مادة: ابادة.

[637] الموسوعة العربية ج12 ص9.

+الموسوعه الميسره: قڕكردنى نەژاديكى بەشەرى لە كاتيكى ديارى كراو[638].

+ قاموس السياسى : پێى وايە تۆبزى كردن بۆ ژيان وفەرهەنگيكى تايبەت كە لەكۆتايدا بە مەبەستى كەم بونەوەيان ،وەك(تحديد النسل يان بلاو كردنەوەى نەخۆشى ..) بە جينۆسايد هەژمار د ەكرێت[639] .

+موسوعه المعرفه: بريتيە لە سياسەتى كۆكوژى ريكخراودژ بە كۆمەلە بەشەرى جياجيا

+فەرهەنگە دەستوريەكان: قڕكردنى كۆمەلە خەلكيك بەپێى پرۆگرامێكى ديارى كراو بۆ لەناو بردنى گشتيان يان بەشيكيان[640] .

+معهد السلام الامريكى : هەمان پيناسى (اتفاقيه منع جريمه اباده الجماعيه)ى كردوە كە لەمادەى دووى ئەو ڕيكەوتنە هاتوە دەقەكەى لەسەروو بلاوكرايتەوە (تعني الإبادة الجماعية أياً من الأفعال التالية، المرتكبة على قصد التدمير الكلي أو الج زئي لجماعة قومية أو إثنية أو عنصرية أو دينية، بصفتها هذه: قتل أعضاء من الجماعة. إلحاق أذى جسدي أو روحي خطير بأعضاء من الجماعة. إخضاع الجماعة، عمداً، لظروف معيشية يراد بها تدميرها المادي كلياً أو جزئياً.فرض تدابير تستهدف الحؤول دون إنجاب الأطفال داخل الجماعة. نقل أطفال من الجماعة، عنوة، إلى جماعة أخرى[641].

پيناسى ياساى نيو دەولەتى : بە تاوانەكانى كۆمەلكوژى دژ بە كۆمەلە كەسيك دەگۆتريت جينۆسايد

جينۆسايدەكان: زانايان تاڕادەيەكى زۆر بەسەلبى سەيرى ڕووداوەكانى ميژوو دەكەن ،ماركسيەكان ميژوو بە ميژووى ململانيى چينەكان هەژماردەكەن،تەنانەت (ڤۆلتير) وەسفى ميژوو بە تۆمارگاى تاوانەكانى بەشەرى دەكا، (ئەريش فرۆم)يش هاوڕايەو دەلێ :ميژوو گۆڕى فەرهەنگە عەقلانيە

---

[638] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص10.

[639] قاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3 ص1 .

[640] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ص2 .

[641] معهد السلام الامريكى (حل النزاعات بين الاديان) –مركز التعليم والتدريب-2008 ص 80 .

مەزنەکانە[642]، ئەگەر کەمیك زیادەڕەوی تێدا بێت بەلام ڕاستیەکی تیدایە،ئەویش ئەوەیە بە هێز بێهێزی چەوساندۆتەوە ،گەلی جاریش قڕی کردوە ، بۆیە میژووی جینۆساید زۆر کۆنە ئەگەر چی وەك زاراوە لەدوای 1944 هاتە کایەوە ،ئەوەی لە میژوودا ڕوونەو میژوو تۆماری کردوە گەورەترینیان تیمورلەنگ لەسالی 1387ز 70000خەلکی ئەسفەهانی کوشت،بە کەلە سەرەکەیان منارەی دروست کردبوو ،لە رەها قووچەکی گەورەی لێدروست کردبوو،لە1398ز لە دەلهیش80000 کوشت،لە 1401 واشی لە بەغدا کردو30000 بەدەستی خۆی کوشتارگەکەی بەکوشتنی خەلیفە کردەوە،لە ئەوروپاش زۆرجار ڕوویداوە ،لەسەدەی 12 لویسی چوارەمی فرنسی فەرمانی دا هەمو خەلکی شاری (ڤیرتی)بسوتێنن[643] ،ناپلیۆن بەیەکجار 300 دیلی موسولمانی کوشت ،فرنسیەکان هەزارانیان لە جزائر کوشت وبە (وولاتی ملیۆن شەهید)بە ناوبانگە، لەزۆر لای تری ئەفریقا تەنها لەکۆنگۆ زیاتر لە 4 ملیۆنیان لێکوژرا لەسەر دەستی ئەوروپیەکان لە سەدەی 19،پاپا پیۆسی پینجەم فەرمانی داهەمو خەلکی پۆلندا(کە نزیکە 3 ملیۆن بوون) سەرببڕێن بەهۆی وەرگرتنی مەزهەبی پرۆتستان، لەسالی 1945 ئەمریکیەکان بە چەند چرکەیەك 80000 لە هیرۆشیماو ناگازاکی کوشت،حکومەتی عیراق لەسەردەمی (سەدام)50000 هاوولاتی ژن ومندالی بەچەند چرکەیەك کوشت لە هەلەبجە،لە سالی 1995 لە سربنیستای بۆسنە سربەکان 8000موسولمانیان کوشت ،لەو دەمە وا جینۆساید لە بۆرما دژ بە موسولمانانی بەردەوامە،دەتوانین بلێین لەوسەردەمە جینۆساید لەزۆربەی وولاتان ڕوویداوە لەوانە(جینۆسایدی ئەرمەن-کە بەیەکەم پرۆسەی جینۆسایدی فەرمی هەژمار دەکریت، هۆلۆکۆست ،کەمبۆدیا،فلستین،چین،یابان،ئۆکرانیا، ئەمریکیە رەسەنەکان، کوردستان،چیچان،بۆسنە ، کرواتیا ،کۆسۆڤا،دارفۆر،بۆڕندی،ڕواندا..زۆر وولاتی ئەفریقی وئاسیاوی تر) .

لەگەل جەنگی جیهانی یەکەم دروشمی (هەمو شتیك لە پیناوسەرکەوتن)ڕێی پێدان چی چاوی سوپاو میلەت دەشکێنی بەکاری بهینن دژ بەیەکتر ،ئەلمانیا دەچوە هەر وولاتێك کاری وای دەکرد ،روسیا

---

[642] د علی اکبر ولایتی-موسوعة الاسلام وایران ج3ص159 .

[643] جون دیفنبورت –دفاع واعتذار لمحمد والقران –ت:صابر زغلول ص172.

وای دەکرد عوسمانیش وای کرد بەرامبەر ئەرمەن و جاریش وایە بەرامبەر کوردوعەرەبیش، ..بۆیە بەشیك پییان وایە جینۆساید تایبەتە بە سەدەی بیست وگەشەی تکنۆلۆجی سەربازی .

**جینۆسایدی ئەرمەن وپالنەرەکانی:**

لە مێژوودا گەلێ جار کەمایەتی لەلایەن زۆرایەتیەوە چەوسایتەوە ،کاتێکیش ویستبیان دەست ڕاستکەنەوە دژی ئەو زوڵم وزۆریە ئەوا دووچاری قڕکردن هاتوون ، کوشتاری ئەرمەنەکان یەکێکە لەو نمونانە کە لەساڵی 1915-1916 لەسەردەستی تورك ودەسەلاتی ئیتحادولتەرەقی بە جینۆسایدی ئەرمەنەکان ناوزەد دەکرێت، نزیکەی یەك ملیۆن قوربانی بوە یان وەك لەگوتاری (لۆردپرایس بۆ ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانی)دەلێت 800000کەس،تۆینبی دەلێت دەوروبەری 600000کەس دەقەبلێنی ، ئەرمەنەکان هەیە دەلیت 2ملیۆن بوە نوسەری تورکیش هەیە دەلێ تەنها 18000کەس بوون ..، ئامارەکانی ئەو کاتی بۆ ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەنی بریتی بوو لە(کۆی ئەرمەنی لە جیهان )بە 4ملیۆن دەقەبلێنرا، نیوەی لەژێردەستی عوسمانی بوو ،ملیۆن ونیوێکیشی لای ئەرمەنی روسیا بوون .

بە پێی بەلگەنامەکانی ئەرمەنی پرۆسەی جینۆسایدیان بە سیستەماتیك بوە بەفەرمان وفتوای شەرعی ویاسا کراوە ،دەلێن جینۆسایدی ئەرمەن بە مەراسیم دەستی پێکدوە ،لەزستانی ساردی رۆژی 1895/12/18 قۆناغی یەکەمی دەست پێدەکات ئەو رۆژەی لە ئۆرفە لەلایەن شیخێك بەناوی (مەلاسعیداحمد) ئەو مەراسیمە دەستی پێکرد بەوەی ئەرمەنیەکی هەژاریان لە بازاڕ بۆ هێناو لەپیش چاوی خەلکی گۆشاوگۆش سەری بڕی بەتاوانی ئەوەی لە خەلیفە یاخی بوە ،قۆناغی دوەم لە جەنگی جیهانی یەکەم دەست پێدەکاتەوە لەوەی یەکەم فەرمی ترە وبە نوسراوی فەرمی حکومەت دەست پێدەکات،یەکەم جار لە کۆبونەوەیەکی نهینی (مرکزی عامی ئیتحادوتەرەقی) ولیژنەیەکی بالایان لە (بهادین شاکر-دکتۆر نازم –شکریە فەندی وەزیری پەروەردە )پێکهێنابۆ جیبەجێ کردنی ،دوای بوە یاسای (جینشینکردنەوەی ئەرمەن لەشام)لە 27یئەیاری 1915 دەرچوو ، یەکسەر نوسراوی رۆژی 1915/9/16 لە ژێر ناوی(هەموان بکوژن)بە مۆری تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ دەرچوو،دوای لە بەرزترین دەسەلاتی عوسمانی(ئیتحادیەکان)بە نوسراوی فەرمی

ئەنوەرپاشا لە رۆژی 27-1915/2/29فەرمانی کوشتنی گشتی دەکا لە 3 مادە ،یەکەمیان کوشتنی ئەرمەنی 5سال بەسەروو،لەوەوە مانای جینۆسایدیش وەردەگریٚ،.. لە جاری پیشوو زۆر خراتر و بانگەوازی کوشتنی ئەرمەنی دەستی پیکردو بوە شانازی چەندەت کوشتوەو سەرت بڕیە ،هەتا مندال وژنیش ئاویٚر نەدەکران ،ئەوەی دەردەچوو دەبوە عەبدی کۆیلەی مالان ودەکڕان ودەفرۆشران نرخیان هەرزان بە5 قرۆش ، هەریەکە نەزری لەخۆ دەگرت تا200 ئەرمەنی بکوژی کە دەستی نەدەکەوت هاواری دەکرد دەیووت بۆم تەواو نەبوە چ بکەم ،هەلبەتە مال وسامانیشیان دەبوە هی ئەو کەسەی کوشتویەتی، گوندوشارهەبوە بەتەواوی وێران بوە ،لە بروسکەکانی سوپای روس لەکاتی گەیشتنیان بە شاری وان دەلێن تیك وپیکڕووخاون شار بۆگەنی بوە لەبەر تەرم ولاشە ،هەندیٚ سەرچاوە دەلێن لەو شارە 18000ئەرمەنی لێبوە تەنها 200 یان شتیك زیاتری لیٚ رزگاربوە ئەوانیش ژن ومندال لەلایەن خەلکی بە ویژدان ،ئەو کوشتارە بە سەرکردایەتی جەودەت بەگی خزمی ئەنوەر بەگ بوە ،ئیتر دەربەدەری رۆژانی رەشیان بەسەرداهات وبرسیتی وهیلاکی تەنانەت سەربردەی کچیك دەگیرنەوە کە مندال بوەو زۆر برسی بوە بۆنی گۆشتی کردوەو ئەو گۆشتەی مندالی ساوای هەرخانوادەیەك بۆخۆیان دەیان خوارد چوە داوای کردوەو نەیانداوەتیٚ کچەکە دەلیٚە دایکی دایە ئەگەر مردم لە برسان وئەتوش گۆشتەکەی من نەدەیە ئەوانە !!!،زەکی بەگی جەلاد لەسەر ئەسپەکەی ناوەناوە وەك نمایشی ئەسپەوانی خۆی چەماندۆتەوەو مندالیکی ئەرمەنی لە کاروان بەرز کردۆتەوەو چەند جاریك وەك تەزبیح بایداوەو تیٚی هەلداوەو دەماودەست مردن ئامادەبوە ،ووتویوتی ئەوانە هەر بەمندالی تاوان بارن ،ئەو کاروانە دوورودرێژو برسیانەی ئەرمەنی بەهەرشاروگوندیکی تورکی ڕەت دەبوون خەلکیکی زۆر بە تەوشی و داس دەهاتن بۆ کوشتنیان .

بۆیەش تا ئیستا گەرمە چونکە خاوەنی هەیەو تا ئیستا ئەو پرسە یەکلایی نەکراوەتەو ئەرمینیا چاوەڕێیە دەسکەوتی مادی ونیشتمانی گەورەی هەبیٚ لە ڕەهەندی یاسایی (داوای لیبوردنی تورکیا)، ئەوەی ئەرمینیای زیاتر تاوداوە بۆ کۆنگریسی ئەمریکی وپەرلەمانی فرنسی وهەندیٚ وولاتی تر کە ئەو پرۆسەیەی دژبە ئەرمەن بە جینۆساید بناسێنن .لەراستیدا بەر لە هاتنی پارتی دادو گەشەپێدان، ئەمریکا هەردەم دژی باسکردنی هۆلۆکۆستی ئەرمەن بوە، لۆبی یەهودی لە ئەمریکا دژی ئەوە بووە.

لەسەردەمی عوسمانی کەمایەتی بە کەمە نەتەوە نەووتراوە بەڵکو بە کەمە ئاینیەکان ووتراوە ، ئەو کاتی پاڵنەری نەتەوەیی ورەگەزی زۆرلاوازبوو یان هەر نەبوو،بۆیە ئەو جۆرە تاوانە نەدەکرا ،ئەوەی گرنگ دژی خودی خەلیفە نەبیت،مادام دژی دەسەلاتی ئەو بووبیت ئەوا هەریەکیك بیت نەك ئەرمەن هەتا برای خۆشی بێت، فتوای ئاینی دراوە بۆ کوشتنی کەسانێك کە مەزەندەکراوە لە ئایندەیەکی دوور ببنە دژ ،تەنانەت قتوا دراوە برای خەلیفەکان بکوژرێ نەوەك ببنە کۆسپ وکیشەو هەڕەشە لەدەسەلات،لەوانەلە سەردەمی (محمدفاتیح)ئەو فتوایە دراوە دەقەکەی (هەر کیمە نە ئەولاد مدن میسراولا،قرەندا چلرلینی نیزامی،عالم ئیگینی قتل ئیتمك مناسبدەر ئەکسەری علمادخی تەجویز ئیتمچدەر،ئەنونلە عامل ئۆلەکر- واتە :مادام کوشتنی برایەکان خزمەتی رژیمی گشتی دەکات دشێ بەو کارە هەلسی بە پێی زۆربەی زانایان)[644] ،پالپشت بەو فتوایانەسەرنج بدە ئەو کارەساتانە: (قتل بايزيد الأول (1389-1403) أخاه الأصغر وابنه في سبيل ذلك، ومحمد الأول (1403-1421) قتل أخوته الأربعة، ومراد الثاني (1421-1451) قتل أخاه وعمه، ومحمد الثاني (1450-1411) قتل أخاه الرضيع، وسليم باوز (1512-1520) قتل خمسة من أولاد أخوانه وأخوين، وسليمان القانوني (1520-1566) قتل بعض أولاده وبعض أحفاده بدسيسة زوجته، ومراد الثالث (1574-1595) قتل اخوانه الخمسة، ومحمد الثالث (1596-1603) قتل (19) أخا له خنقا قبل دفن أبيه، وعثمان الثاني (1618-1622) قتل أخاه.. وبعضهم خلع وقتل...)[645]،ئاوا کاردانەوەی توندیان هەبوە بۆ پاریزگاری لەتەخت ،ئەگینا ئەوەندە لەسەر نەتەوەگەری ومەزهەب وئاین توندوتیژی نەدەبوو،تەنانەت لە دەستوری عوسمانی (مەشروتیە)کە پێك هاتبوو لە 119 مادە و 4368 ووشە بەیەك ووشەش ناوی تورکی تیا نەهاتوە[646]،بۆیە کەس نەیدەزانی کێ چ نەتەوەیەکەو ئەوی تر چیە،ناوو نازناوی هیچ خەلیفە وسەرکردەیەك بە تورك نەهاتووە، (د. قوتیبە شهابی) فەرهەنگێکی دەگمەنی لەناو نازناوی خەلیفە و پادشا و سوڵتان و والیەکانی مێژووی ئیسلام

---

[644] عبدالعزيز شناوى –الدوله العپمانيه دوله اسلاميه مفترى عليها ج1ص349 هەروەها د محمدالبرواری –الكـورد والدولـه العپمانيه ص122 .

[645] الدولة العلية العثمانية- ص777

[646] بڕوانە دەقی یەکەم دەستوری عوسمانی دەرچووی 24/12/1876 .

کۆکردۆتەوە بەناوی (معجم ألقاب أرباب السلطان في الدول الإسلامية من عصر الراشدي حتى بدايات القرن العشرين).. لەو (معجم)ەدا تەنیا نازناوێکی نەتەوەگەری یان رەچەڵەکی تیا نیە وەك شانازی بە عەرەبایەتی یان بە تورکایەتی یان بە کوردایەتی و فارسایەتی.. کرابێ، لەسالی 1461ەوە لەسەردەمی (سولتان محمدی فاتیح)دان بە بوونی ئەرمەن ومسیحی هینراوە ،هۆراگیمی ئەرمەن کرایە نوینەریان ،دوای لەهەردووخەتی گولخانەو همایۆنی سەرەتایەك لەو مافانە بە دیکۆمینتی ئەکادیمی ویاساییش هاتوە ، فەرمانەکانی عوسمانی بەناوی (خەت همایۆنی )دەرچوەلەلایەن سولتان عبدالمجیدمۆرکراوە لە 1856/2/18 بەرامبەر 11 جمادی الاخر/1272بۆ یەکسانی و هاوولاتی مسیحی وموسولمان وکەمایەتی تر ،لە سالی 1864 یاسایەکی تایبەتیش بۆ یەهودی بەناوی (نیزام حاخامخانە)دەرچوو بۆ هەردوو ئەنجومەنی (روحانی وجسمانی)یەهودی، لە مەشروتیەی عوسمانی(دەستور) دیسان ئەو یەکسانیە لە بابی( في حقوق تبعة الدولة العثمانية العمومية)لەمادەی (8)ەوە تا مادەی(26) دەگرێتەوە، ئەندامانی پەرلەمانی (مەبعو وسان)نوێنەری نەتەوەو ویلایەتەکەیان نەدەکرد بەلکو هەریەکە بەپێی مادەی(71)لە دەستووری عوسمانی(مەشرووتیەی یەکەم) نوێنەرایەتی هەموو میللەتی عوسمانی دەکرد[647]، تەنانەت لە دەزگای رەگەزنامەی عوسمانلیەکان ناوی نەتەوەیی تۆمار نەدەکرا، یەکەم جارلە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحاد ولترقی(دوای 1908) بەرامبەر هەر ئەفسەرێکی غەیرە تورك هێمایەکیان بەرامبەر دادەنا(ع) بۆ عەرەب*، (ك)بۆ کورد.. بەشێوەی گشتی بوونی ئەرمەن وکەمایەتی تر لە چاو ئەوسا باش بو هەندێ پۆستی گرنگیشیان پێدرابوو ،ئەندامی مەبعوسان و وەزیریان هەبوە ،14 ئەندامیان لە مەبعوسانی عوسمانی (پەرلەمان)هەبوو ژمارەشیان ملیۆنیك بوە، ساسۆن حەسقیلی یەهودی بەناوبانگە، ئەندام پەرلەمانی مەبعوسان بووە، بەنوێنەرایەتی بەغدا،لەراپۆرتی (غرفه التجاره)ی بغدای سالی 1935 دەردەکەوێ 60٪ی بازرگانانی بەغدا یەهودی بووینە ،لە 13 بازرگانی شەکر یازدەیان لەوان بوە بۆیە رۆژانی

---

[647] دەقی مادەکە: المادة الحادية والسبعون: (كل عضو من هيئة المبعوثان لا يعتبر وكيلاً عن الدائرة التي انتخبته وإنما يكون في حكم وكيل عموم العثمانيين).

* واتە عەرەب، گوایە ئەو ئەفسەرانە گومانی ئەوەیان لێدەکراکەپەیوەندیان بە سوپای هاوپەیمانان هەبێ لەجەنگی جهانی یەکەم

شەمە پشو بوو لە بەغدا[648]، ئەوەکەی تر لەدەست عەجەمەکان بووە، ئەوەش راستە کە ئەوان زیاتر لە بارودۆخی نێودەوڵەتی ئاگادار بوون، یەکەم کۆمپانی لەناو عوسمانی ئەرمەنیەك بوو لەسالی 1896بەهۆی عارەبانەیەکی (گالیسکە)بە ئەسپ لەنێوان بەسرەو عەشاراگواستنەوە بکات[649]، لە ئەستەنبۆل 30000بازرگان هەبوە ئەوانەی لە (ژووری بازرگانی)تۆمارکراون سالی 1912،لەوانە 25٪ی ئەرمەن بوە ،45٪ی رۆمی بووینە ،تەنها 15٪ی تورك بوینە ،لەوەوە لەگوتاری (لۆردپرایس بۆ ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانی)لەناوموسولمانان دژایەتی ئەرمەن ومسیحی نەبوە .

ڕیشەکەی: وەك دەرکەوت تا ڕادەیەك پێشتر لێبوردەیی و پێکەوەژیان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، دواتر تەوەری عەلمانی نەتەوەیی سەری هەڵدا، سەرەتا لە ئەوروپا دەستی پێکرد و دوایی هاتە جیهانی ئیسلامیش، کە بزوتنەوە نەتەوەییەکان دەستی پێکرد، ئەو گێروگرفتەی ئەرمەنیەکانیش سەری هەڵدا، ئەو بزوتنەوە نەتەوەییانە وایکرد کە هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بدرێت، ئەوەی کە ناوی لێنراوە دەوڵەتی نویێ،ئەو شەپۆلە گەیشتبوە ئەرمەنەکانیش

لەلایەکی تریش لەسەدەی نۆزدەیەم دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی دەڕۆیشت، لە ئەوروپای رۆژهەڵات چەند نەتەوەیەك هەستی نەتەوایەتیان بۆ پەیدابوو، میللەتی ئەرمەنیش ئەو هەستەیان بۆ هات و بوژانەوەیەکی نەتەوەیی روویدا، روسیاش بەناوی (پادسلافیزم) یارمەتی ئەرمەن و چەند میللەتێکی ئەوروپای رۆژهەڵاتی دەدا، تا گەیشتە دروستکردنی دەوڵەت، ئەو بابەتە لە کۆنگرەی بەرلین سالآنی 1887 زیاتر سەری هەڵدا لە ژێر ناوی (چاکسازی لە بارودۆخی ئەرمەن) دوو مادەی بۆ تەرخان کرا ، بوە هۆی ئەوەی چەکی سەربەخۆیی بدرێتە ئەرمەنیەکان، لەوکاتیەوە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی لەلای ئەرمەنیەکانەوە دەستی پێکرد بەناوی (استقلال)، سنوری ئەو دەولەتە لەژێر ناوی چاکسازی بێتە دی ،چاکسازیەکان ئەنادۆڵی رۆژهەڵات وتاکوردستانی دەگرتەوە، ئەگەر جێبەجێ بکرابایە هەموو کوردستانی باکور دەبووە ولآتێکی ئەرمەنی ،لایەك لە نەخشەکانی ئەوروپا و ئەمریکیەکان بەرنامەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیان هەبوو لە هەموو کوردستانی باکوروەك،وەك دوایبە ڕوونی لە

---

648 د.علي الوردي- لمحات.. ج5ص127

649 د.كمال مظهر - الطبقة العاملة العراقية .. ص 23

ریکەوتنی سیڤەر زیاتردەرکەوت لە کۆنگرەی سیڤەری 1920 هەرمابوو، ماددەی 89ی سیڤەر تایبەت بوو بەو دەوڵەتە ئەرمەنیەی بەشێکی ویلایەتەکانی کوردستانی دەگرتەوە، جمال پاشاش لە یاداشتەکانیدا دەلیت :ئەرمەنەکان بە پشتیوانی روسیا ولایەتەکانی (ئەرزەرۆم ودیاربکروسیواس وخارپووت وبەتلیس و ڤان)یان دیاری کردبو بۆدەولەتیکی ئەرمەنی[650]، دوایش لەمادەی یەکی لائیحەی (پرۆژەی چاکسازی روسی-22مادەیی)هەمان بیرۆکە هاتبوو بەناوی (پرۆژەی پورتقالی ژ:50) ، دوایی لە رێکەوتنێکی فەرمی نێوان حزبی خۆیبوونی کورد و بزوتنەوەی تاشناق( لەماددەی دوو ئیلغا کرایەوە)[651]، ئەرمەنە نەتەوەپەرستەکان ئیسستاش ئەو نەخشەیان هەیە، تیایدا ئەو دەوڵەتە تا زاخۆو دهۆکیش دەچێت و دەڵێن ئەمە دەوڵەتی ئەرمینیای کۆنە، لە لای رۆژهەلاتیش ئەرمەنەکان دەیانویست بەیارمەتی روسیا ئەو دەوڵەتە دامەزرێنن لەسەدەی نۆزدە ،زۆربەی نێو شارەکانی کوردستانی باکور ئەرمەنی نەبوون وەك زۆرجار وادەگۆترێتەوە.. لەهەمان کاتیشدا روسیا چەند کۆمەڵەیەکی ئەرمەنی چەکدارکردبوو، هەڵدەستان بەکاری تیرۆریستی لە گوندەکانی سەر سنوری روسیاو دەوڵەتی عوسمانی،هەندێ لەئەرمەنەکان لە تۆمارەکانیاندا دەرکەوتوە ڕایان وابوە کە کوردستان وڵاتی کوردان نیە، بەڵکو لەمێژوودا بەزۆر بەکورد کراوە و بەئیسلام کراوە، جارجارئەرمەن و کورد شەڕیان بووە، لەسەر عەرد و موڵك بووە، بەلاّم ئەمە کێشەیەکی ئەوتۆ نەبووە، بەگشتی بەر لە هاتنی اتحادوترقی هیچ بەرنامەیەکی دارِشتراو نەبووە بۆ لێدانی ئەرمەنەکان، چی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە، چیش لەلایەنی کوردەوە.. ، ئەو نەخشەیەی دەولەتی ئەرمەنی لە ئەرزەرۆمی تورکی وسەرووی کوردستان ترسێکی دروستکرد، گوندنشینەکان کۆمەڵێك گوندیان جێهێشت، ئەمە بەرنامەیەك بوو بۆ چۆل کردنی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی. ئەمەش وادەکات سوڵتان عبدالحمید لەگەڵ سەرکردەی هۆزە کوردیەکان دابنیشێت و پێیان بڵێت کە

---

[650] مذكرات جمال باشا-اعداد:محمدالسعيدى ج1ص428-429

[651] لەپەرەگرافی (ب)ی مادەی (2)ی رێکەوتننامەی ساڵی 1927/10/29 بزوتنەوەی تاشناقی ئەرمەنی و بزوتنەوەی (خۆیبون)ی کورد هەڵوەشێنرایەوە .دەقەکەی : اخذين فى الاعتبار البادىء الاثنية والقانونية المنصوص عليها فى معاهدة سيفر —المادة 89من المعاهدة والذى يمنح ولايات وان وبتليس وارضروم الى ارمينيا باطل ولايعمل به،فيمايعترف الطرفان بحقوقهما المتبادلة فى الولايان المذكورة.

مەترسیەکی وا هەیە، ئێوە رەئیتان چیە؟ لەوەوە سوارەی حەمیدی دێتەکایەوە،هەرچەندەزۆربەی سەرکردەکانی سوارەی حەمیدیە بوون لەدوای ئینقلابی 1908 چەکیان دژی دەولەت بەرزکردەوە بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم میلی پاشا و لەساڵی 1923 کۆمەڵەی ئازادی کوردیان دروست کرد، سوارەی حمیدی لە ساڵی 1891دا دامەزرا ئەو کاتی بزاڤی نەتەوەیی کورد سەری هەلنەدابوو ، لەدوای 1908 کە ئیتحادیەکان ئینقلاب بەسەر عوسمانی دەکەن و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد سەرهەلدەدا سوارەی حمیدی بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم میلی پاشا دێنە پال کورد وریزی دەولەت بە جێدیلن ،ئینجا ئیتحادیەکان بەدیلی سوارەی حمیدی فەجەسوکەکان دادەمەزرێنن ،ناویشیان (افواج خفیفە)بوو جیا بوو لە سوارەی حمیدی ،ئەوەی بەشداری تاوانی جینۆسایدی کرد ئەو فەوجانە بوون نەك سوارەی حمیدی وکوردی تر ، سەرەتا بەبڕیارێکی سەرووی ئیتحادوتەرەقی لەسالی 1915 بەکوشتن یان دەرکردنیان وهەندیکیشی گواستەوە بۆ شام ومیزۆپۆتامیا زیاتر ئەوانە لە ڕێگادا تووشی ئەزیەت وئازاری زۆر خراپ بوونەوە لە برسیەتی وماندوویی ونەخۆشی وڕێگری وتالان وکوشتن .

هۆکاری ڕاستەوخۆ:

هۆکارەکان لەدوولاوە دێت ،لەلایەك عوسمانی وەرچەرخا لەسەردەستی ئیتحادیەکان بۆ تێزێکی تورکایەتی وناشیۆنالیزمی(تۆرانی)،هەلەی هەرە گەورەی ئەرمەن وکوردوعەرەب وچەرکەس.. ئەوەبوو ڕەوشەنبیرانیان لە سەرەتایارمەتی ئیتحادیەکانیان دا،جۆرە هاوپەیمانیەك لە نیوان تاشناکی ئەرمەنی و تورکیای لاو لە نەوەتەکانی سەدەی 19 دەست پێدەکات دوایش لەگەل ئیتحادوتەرەقی ، لە کۆنگرەی پاریسی 1902/2/4 جارێکی تریش وەفدی ئەرمینی و عەرەبی و کوردی و یارمەتی وەفدی ئیتحادوترقی دا بۆپالپشتی کردن وسەرکەوتنیان بەسەر عوسمانی ،لەدوای ئینقلابی ئیتحادوتەرەقی لە1908/7/23 هەردوو حزبی ئەرمەنی سەرەکی هەنجاك وتاشناك هەمو جۆرە چالاکیەکیان دژی عوسمانی ڕاگرت ولە حکومەتی نویَ نزیك بوونەوە لە 1909/9/3 گەیشتنە ریکەوتنیکی هاوپەیمانیش،هاوپەیمانی ئەرمەنی وتورکی لە پیش جەنگی جیهانی یەکەم گەیشتە ئەو ڕادەی هەردوولا هاریکاری یەکتر بکەن دژی کورد،لەشەڕی بەلقانی 1912 ئەرمەنەکان شەڕی چاکتریان بۆ عوسمانی کردنەك تورکەکان ،تەنانەت جمال پاشا لە یاداشتەکانی باسی حزبی تاشناك

وەك نزيك ترين لايەن لەوان وەسف دەكات[652] ،ئەو هاوپەيمانيە تا سەرەتاى جەنگى جيهانى يەكەم بەردەوام بوو ،زياتر لەوەش لە 1913/6/8 بۆ چاكسازى بارى ئەرمەنى (پرۆژەى پورتقالى ژ:50)[653] ،دواى رێكەوتنێكى روسى وعوسمانى بە مۆرى(سعيدحليم پاشاى سەدرى ئەعزەم وسەركۆنسۆلى روسى (گۆلگڤيتچ) لەرۆژى 26/كانونى دوەمى 1914هەر لە قازانجى ئەرمەن،لەو سەروبەرە گۆلگفيتچ نامەيەكى پڕ لە گەشبينى بۆسازانۆڤى وەزيرى دەرەوە دەنێرى تيايدا باسى دۆخى ئەرمەنى لەناو عوسمانى بەباشە باس دەكا، دواى ڕووبە ڕووبوونەوەى عوسمانى وڕووسى ئەو هاوپەيمانيەيان تيكدەچى، تەنانەت لە ئەستەمبۆل تا 1915/4/24دام ودەزگاى فەرهەنگى ئەرمەنى بە ئازادى ئيشى كردوە و لەناكاو هەمويانيان دەست بەسەركردو لەشيوەى ئەنفال هەمويان لەناو بردو ئەورۆژە يادى ئەو جينۆسايدەيە كە ئەرمەنەكان سالانە يادى دەكەنەوە .

لەلايەكى تريش ئەرمەنيش جم وجۆلى سەربەخۆى وشۆڕشى دەست پێكردوهاريكارى روسى كرد،بەتايبەتى لەدواى ئەوەى زۆربەى ويلايەتەكانى رۆملى (ئەوروپى)سەربەخۆيان لە عوسمانى وەرگرت بە تۆبزى ،ئەو بوێريەى بە ئەرمەن دا بەو ئاڕستە بڕوات ، يەكەم جار كاريگەر سەربەخۆيى بولگاريا بوو لە 1878 بوە هۆى ئەوەى هەندێ كۆميتەى شۆڕشگێڕى ئەرمەنيش دروست بێت بيرلە شۆڕش وڕاپەڕين بكاتەوە، دواى جەنگى روسى وعوسمانى (1877-1878)هەردوولاله لە سانستيفانۆ ودوايش لە برلين لە 1878ريكەوتن لە مادەى 16 و61 باس لە پرسى نەتەوەيى ئەرمەن كرا كە عوسمانى زۆر قينى بۆ دروست بوو ، بەلام دەرفەتى تەواو گونجاو نەبوو تا جەنگى جيهانى يەكەم(1914-1918) ئينجا عەرەب وئەرمەن زياتر لە ميلەتانى تر قۆستيانەوەو هەولى ڕاپەڕينيان دا بە فيتى وولاتانى هاوپەيمان ،هەردوولا تووشى كوشت وبڕ بوونەوە ،بەرامبەر عرب جمال پاشاى فەرماندەى شامى عوسمانى زۆربەى سەركرەكانى شامى لەداردا،بۆ ئەرمەن ڕەهەندى ئاينيشى تێوەگلێندرا، مەترسى ڕوس وسەركەوتنەكانيشى زياتر فشار كەوتە سەر ئەرمەن كە بە هاوپەيمانيكى سروشتى روس هەژماردەكرا، كۆميتەكانى شۆرشگێڕى ئەرمەنى بەگەرجنرالى روسى (گيۆرونزوف)

---

[652] مذكرات جمال باشا ج1 ص437 .

[653] ئەو پرۆژەيە لە1913/6/8 دەرچوە پيكهاتوە لە 22 مادە بە (الكتاب البرتقالى رقم 50)ناوزەد دەكرا .

کەوتن ، تەنانەت بەشێك(هەندیك لەوانە سەرچاوەی رۆژئاوایش) پێیان وایە یەکەم جار ئەرمەن بەهۆی سەرکەوتنەکانی رووس لە وان وبایزیدوبتلیس تادەگاتە رواندز ڕەشەکوژیان دژی موسولمان وکوردوتورك وخەلکی ترکردوە ، چەندین ڕاپۆرتی رۆژئاوایی باس لە ئاماری کوشتارو ویران کردنی گوندو مزگەوت وتەکیە کراوە لەسەردەستی ئەرمەن یەکەم جار، رۆژنامەی( سەربەستی) کە لە ئەستەمبۆل دەردەچوو بەردەوام ئەو داتانەی بلاو دەکردەوە،ژمارەی(481)ی رۆژی30/ئەپریلی 1919 تایبەت کردبوو بە لیستی ئەو گوندو شارۆچکانەی ئەرمەنیەکان تیایدا کوردو تورك وموسولمانی تریان ڕەشەکوژو دەرکردبوو وەك پاکتاوی ڕەگەزی ، وابە نیازبووینە جۆرە پاکتاوێکی ڕەگەزی لەگەل سەرکەوتنەکانی روسی بکەن ئەو ناوچانە بۆخۆیان پاك بکەنەوە ، بیجگە لە کۆمیتەکان کۆمەلێك دەستەو تاقمی تیرۆریستیش لەناو ئەرمەن سەری هەلدادژ بەتورك وکوردو موسولمانانی تر،لەوانە: کۆمەلەی شێرەکانی خاچبەسەر،کۆمەلەی تاشناك،تاشناکی سوتن .. ،محمدئەمین زکی بەك لەکتیبەکی(خلاصە..)دەلیٚ نزیکەی700000کوردیان کوشت، توێژەریکی ئەرمەنی دان بەوە دەهێنیت لە کتیبیکی بەناوی(الدولة العثمانية والتغيرالديموجرافي في اناضول) ودەلی ئەرمەنیەکان کەم بوون دەیان ویست خۆیان زۆرایەتی دەرخەن بە پالپشتی روسیا.

ڕۆلی گرنگی ئەرمەن شان بەشانی روس شاراوە نەبوو پیش 1915،ترۆتسکی هۆکاری چوونە نێو جەنگی جیهانی لەلایەن قەیسەر کورت کردۆتەوە لە ( وكانت أهداف الحرب الروسية هي المضائق التركية، وغاليسيا، وأرمينيا)[654] ، هەروەهاچەرچل لە کتێبەکەی (قەیرانی جیهانی) باس لەشەڕی ویستل دەکا لەبەرەی روسی عوسمانی سالی 1914 ستایشی ئەرمەن دەکا بۆ ئەو سەرکەوتنە ،ئینجا لەسالی 1915 تیپەکانی ئەرمەن (یەکەم ودوەم وسێیەم وچوارەموپینجەموشەشەم)شارەکانی وان وسەریٚ قامیش وزۆرلای تر چوون وەك پیشڕەوز بۆ روس،بە سەرکردایەتی هەریەکە لە (ئینترانیك پاشا وهامازاساپ وئەرزارۆملۆ و..)،تیپی یەکەم وپینجەم بە فەرمانداری (ئارگۆتیان)ی ئەرمەنی دەریاچەی وانیان گرت،فەوجی شەشەم بە فەرمادارى (ئافشاریان)مەلازگرد وتیایدا خۆشی کوژرا،دیسان لەگرتنی بەدلیس ووهەتا لەشەڕی کوردستانی ئێرانیش بەشداربوون ، لەو بەرانە ئەنوەر

---

[654] لیون تروتسکی –تاريخ ثورة الروسية ج1ص45 .

پاشای وەزیری جەنگی عوسمانی خۆی ڕووبەڕوویان بوویەوە بۆیە وافەرمانەکانی قڕکردن لەناوەندی دەسەلاتەوە بەخێرایی بۆ ئەرمەن دەرچوو .

چەندین هۆکاری تریش هەیە بۆ ئەو کارەساتانەی بەسەر ئەرمەن هات،هەندیکی تایبەتە بە عوسمانی و ئینجا ئەو گۆڕانکاریانیەی لەدوای لەسەر دەستی ئیتحادوتەرەقی هاتە کایەوە و هەندیکیشی پەیوەستە بە گۆڕانکاریە ئیقلیمی وجیهانی وبەشێکی گرنگیشی پەیوەستە بە خودی ئەرمەنەوە ، بنەمای فیکری ئیتحادوترقی رەگەزپەرستی بوو، بەرلەوەی بێنە سەر حوکم بەخۆیان دەوت (جمعیە ترکیا الفتاەکە لە 1864 دروست بوو)، دەیانویست لەجیاتی دەوڵەتی عوسمانی هەمەڕەگەز دەوڵەتێکی تورك رەگەز دامەزرێنن،زیاتر ئەو مەیلە لەدوای سەردانەکەی ئیمپراتۆری ئەلمانیا دیت بۆ ئەستەمبۆل کە ئامۆژگاری کردبوون بۆ ئەوەی لەو هەمو کیشەیە رزگاربن واز لە بەرپرسیاریەتی ئیسلامی وعوسمانی هەلگرن ڕوو لە بەرپرسیاریەتی تورکی بکەن ،لە 2ی ئۆگستی 1914 ڕیکەوتنیکی نهینی بەو مەبەستە لە نیوان عوسمانی وئەلمانیا مۆر کرا،بەمەبەستی دروست کردنی دەولەتیکی پان تورکیزم کە زیاتر سنوری رۆژهەلاتی عوسمانی دەگرتەوە ، میلەتانی ئەرمەن وکوردو سریان لە نێوان تورك وئازەر وکازاخ وباقی میلەتانی تۆران هەبوو ،بۆ جیبەجێکردنی ئەو پرۆژە نوێیە پیویستی بەلادانی ئەو میلەتە غەیرە تورکانە هەبوە ،ئەم بنەما فیکریانە هەلبەتە بە ئەنفال کۆتایی دێت، دژ بە ئەرمەنو کورد و دوایی عەرەبیش،لە کانگەی جەنگ جمال پاشا قەسابخانەی بۆ ئەفسەرە عەرەبەکان لەشام بەرپا کرد، هەرە دوایشی هاتنە سەرحوکمی مستەفا کەمال وئەو جینۆسایدەی کوردی لە خەربوت ودیرسم و تەنانەت گازی کیمیایشی بەکارهێنا.

هەرچی هۆی راستەوخۆیەدوو هۆکاری دەماو دەست بوو یەکیان گۆڕانی ڕای حزبەسەرەکیەکانی ئەرمەن بەلای روسیاو لە بەیانیکی ڕێنماییان بۆ ئەرمەن وبۆ سەربازانیان لەریزی عوسمانی یارمەتی روسیا بدەن ،سەرکەوتنی روسیا لەسەرەتا سەرکەوت دوای بەرەی رووسی لەلایەن (مارشال ماکنسۆن) شکێنرا ئیتر عوسمانی وای زانی بەیەکجاری شکاو دەستیان بۆ ئەوانە برد کەخیانەتیان کردوەو ڕوویان لە ئەرمەن کرد، لەلایەکی تریش ئەنوەر پاشا سەرکردایەتی لەشکرێکی گەورە دەکا تا بچێت لە قەوقاز گورزێکی گەورە لە لەشکری روسی بدات، هەستی کرد ئەرمەنەکان بە یارمەتی سوپای

رووسی لەپشتی سوپای عوسمانیەوە کرداری گەریلایی ئەنجام دەدەن، بۆیە دەسەڵاتی ئیتحادوترقی بڕیاریدا ئەمانە لەسەر سنور لابدات، تەلعەت پاشای وەزیری ناوەخۆ بروسکەیەکی بە ژ:723 تەعمیم کرد ئەمەش لادانێکی زۆر گەورەبوو، بەپێی مێژوونووسان کەمترین ژمارە ئەوەیە نۆسەد هەزار ئەرمەنی لەسنور لادەدرێن و بەرەو بیابانی سوریا و شوێنی تر دەیانبەن، لەرێگا ژن و منداڵ و زۆری تر لەبەر برسیەتی و نەخۆشی و سەرما دەمردن بەر لەوەی بگەنە شوێنەکان. ئەمە بیانوەکەیان بوو، بەڵام هەر لەبنەڕەتدا اتحاد وترقی بەرنامەی لێدانی ئەرمەنەکانی هەبوو.

ئەوەی پیشینەیە بۆ لێدانی ئەرمەن ئەوەیە هەندێ ڕای لەنگی میلی باوی پیدراوە ئەوانە کافرن وکوشتنیان غەزایە ،ئینجا لە معادەلەی عوسمانیش کەمایەتیە نەتەوەییەکان کەمێك پەراوێز خرابوون، لە بەرژەوەندی ئەوان بوو کە پێشڕەوایەتی بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بکەن، ئەگەر سەرنج بدەین بەشی زۆری بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی و تورکی، لەلایەن مەسیحی و جولەکە و ئەرمەنی سەرپەرشتی کراوە،بە هەمان سەرنج دەبینین ئەوەی بزوتنەوەی فەلسەفیشی بۆ جیهانی ئیسلامی هیناوە زیاتر ئەو کەمایەتیانەن ووردتر دەبینین بەشی زۆری شاعیرو زاناو موفەکیرەکانیش لە غەوارەو کەمایەتی وکۆچ کردوەکانن ،هەربەوشێوەش بینیمان بازرگانەکانیش لە کەمایەتیەکانن، هەر ئەوانەش زیاتر خەلکی شاری پێك هێناوە ، ئەوانە هەموی یەك هۆکاری سادەی هەیە کە ڕوونیش دەبێتەوە بۆیەهودو مەسیحی و ئەرمەنەکان پیشڕەو بووینە لە داهێنان وبازرگانی و گۆڕینی ئەو واقیعەی ناو عوسمانی ، لە بارەی هێنانی بیری نەتەوەیی ئەوا هۆیەکەی ئەوەیە معادەلەی عوسمانی لە قازانجی کەمایەتیەکان نەبوو، معادەلەی نەتەوەیی لەقازانجیاندا بوو، لەو چوارچێوەیە پێشڕەو بوون، واتە لە جیاتی ئەوەی ناوچەکە بەسەر ئەرمەن وموسوڵمان دابەش بێت (دەبنە کەمایەتی) کەچی ئەگەر ناوچەکە لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی دابەش بێت ئەوان کەمایەتی نابن ،کەواتە سەرەنجامیکی لۆژیکیە ئەوان هەول بۆ هەلوەشاندنەوەی عوسمانی بدەن و لە جیاتی کۆمەلێك قەوارەی نەتەوەیی وڕەگەزی لەجێی دروست بکەن ، چەندین ڕێکەوتننامە لەو پێناوئەوان کرا، لەلایەکی ترەوە هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم و چوونی عوسمانی بۆ پاڵ ئەڵمانیا، چونکە لەسەرەتاوە وایان زانی

ئەڵمانیا سەركەوتوو دەبێت، ئەرمەنیەكانیش لای روسیایان گرت، ئەرمەنیەكان دەیانزانی وا میراتی عوسمانی دابەش دەكرێت، دەیانویست پشكی گەورە بەبەر ئەوان بكەوێت.

بەرپرسیاریەتی ئەوتاوانە

ئەوەی كە ڕوون وباوە ئەوەیە كە هەمو سەرچاوەكان پەنجە بۆ عوسمانی دەبەن ،ناوی سولتان عبدالحمیدیش ئامادەیە ،لەو دواییە دەولەتی توركیا هەولی ئەوەی داوە كوردو جاروایە یەهودی ولای تریش بكاتە برابەش لەو تاوانە ،نوسەرومیژوونوسەكوردەكانیش بە هەلەیی دریغیان نەكردوە لەیارمەتی دانی توركیا بۆ ئەوەی ئەو تاوانە بەمل كورد دابهێنریت ، جاریش وایە كەزۆر بەووردی ساغ دەبێتەوە بەسەر ئیتحادوتەرەقی لەویش دەلێن سەركردەكانی ئەوانە زۆربەی یەهودی دۆنمە وماسۆنی بووینە،بۆ ئەو مەبەستە نوسەری ئەرمەنی ( سەركیس ئاشگیان)یش ئەو بۆچوونە پشت ڕاست دەكاتەوەو دەلێ ئەو یەهودیانە ئەگەر ڕاستەوخۆش ڕۆلیان نەبووبێت ئەوا یارمەتی دەربووینە.

رۆلی كورد بەمانای ئەرێنی ونەرێنی هەردوكیان هەبوە ،هەروەك لەو كارەساتە كوردو عەرەب ولازوچەركەس بەشداربووینە،بەشیكیش لەو زیندانیە تاوانبارانەی كە ئیتحادیەكان ئازادیان دەكردن لە ئەرمەنەكانیان بەردەدان هەندی لەو زیندانیانە كورد بوون،ئازەربیجان وناوی ئەلمانیاش هاتوە ..، لەكانگەی جەنگ جەنەرال(فۆن ساندریز)ی ئەلمانی دەكرێتە (موفەتیشی گشتی سوپای عوسمانی)، (ڤالنكهاین)یش دەبێتە سەركردەی (جیوش الصاعقه)بۆبەرەی بەغدا، جمال پاشای سەركدەی سەربازی بەرەی شام لە یاداشتەكانی خۆی باسی رۆلی ئەلمانیا دەكات لە كوشتنی ئەرمەن ،لە (ل481 و ل484)وینەی كۆبونەوەیەكی بلاوكردۆتەوە لە نیوان تورك وئەلمان بۆ لیدانی ئەرمەن [655]،لەكوردا ناوی موسا بەگ زۆر هاتوە لەلایەن (لازاریف وشاخۆفسكی وزۆر لای تر)ئەویش هاریكاری ئیتحادیەكان بوە نەك بزوتنەوەی كوردایەتی،ئەوەی بەشداری سەرەكی توركەو ئیتحاد تەرەقیە ئەوانی تر وەك ڕەگەز بەشدارنەبووینە بەلكو وەك ئەندامی ئیتحادوتەرەقی بەشداربووینە وەك دەردەكەوێ ئەو

---

[655] مذكرات جمال باشا ج1ص481-

بڕیارە مەرکەزی بوە وبە ڕێنمایی فەرمی ئەنوەرپاشاو تەلعەت پاشا کراوەو دوور نیە دەستی بڕیارێکی دەولی (وولاتانی تەوەر)بووبێت،بەداخەوەبەشیکی زۆر لەو ڕوەوە نوسەر وڕەوشەنبیرو میژوونوسی کورد بەهەلەداچووینە لەهەموان زیاتر میژوو نوسی گەورەی کورد د کمال مەزهەر) باس لەوبەشداریە بە زیادەڕەوی دەکات و کەمتر باسی چاکەو ڕۆلە ئەرینیەکانی کوردی کردوە لەو کارەساتە ،لەهەندێ شوێنیش باس لەهەندی رووداوو و دیاردە دەکا بێئەوەی بنچینەیەکی وای هەبێت ،دەلێت (باجی کافرانەیان)لە ئەرمەن وەرگرتوە ، یان دەلێ شەوی یەکەمی بووکی ئەرمەنی پیش زاوا دەبوایە بهاتبایە لای ئاغەی گوندی ..ئەوانە هیچ بنچینەیەکی نیەو جیشی نابێتەوە لە نێو کۆمەلگەی کوردەواری ،ئەو لە بنەچەدا لە کتیبی (لازاریف)ی وەرگرتوە Lazarev- the kurdish Question) )بە دەستکاری هەلە لازاریف ئاوا نالێت ،یان دەووترا گوایە ئەرمەنی وەك کۆیلە دەکرِان ودەفرۆشران لە نێوان دەرەبەگە کوردەکان ..ئاوا نەبوە ئەو کارە لەچاو جینۆساید رزگارکردنیان بوە ،بۆیە بەبروسکەی ژ:603 ی رۆژی 1915/11/5 بە فەرمانی وەزیری ناوخۆ(تەلعەت پاشا) دەلێت بیستومانە هەندێ ژن ومندالی ئەرمەنی لەکوردستان(سیواس-مەعمورە عزیز- دیاربەکر- ئەرزەرۆم)دالدە دراون بەناوی خزمەتکاری دەست بەجێ هەمویان کۆکەنەوەو بۆ بیابان با تۆبڕاو بن،ئەرمەنیش ئەوەندە لاواز نەبووینە بگاتە ئەو ڕادە وا کڕین وفرۆشتنیان پێکرابێت پیش ئەو کارەساتانە،ئەوە لەو کاتە بوە کە جینۆساید کران لە هەندێ شوین ، وەك (میجەر ماکسۆن)یش لە سیمیناریکیدا بۆ(جمعیە الملکیە الجغرافیە-لندن)دەلێت بۆ ئیمەیان واباس دەکرد کەکورد ئەوجینۆسایدەی بەرامبەر ئەرمەن کردوە کەچی ئیستا دەرکەوتوە ئەوان نین و مەسیحیەکان زۆر بەخۆشی ژیاون لەکوردستان بەلای کەمی تاجەنگی جیهانی یەکەم .

بۆ دیاری کردنی تاوانبار سەرەتا پیویستمان بە هەندی روون کردنەوەی مەدرەسەیی هەیە، وەك لەسەرووش باس کرا بارودۆخی ئەرمەن وکەمایەتیەکان تاڕادەیەك باش بوە لەسەردەمی عوسمانی ،جگە لەهەندێ هەورازونشیویش،سولتان عبدالحمیدخۆی لەیاداشتەکانی ووتویەتی پیگەی ئەرمەنەکان لامان زۆر جیگەی ریزبوەو هەندیکیان پلەیان گەیشتۆتە وەزیری مەزن[656] لەوڕوەوە (بنی

[656] الصحوة الرجل المريض ص 94 .

مرجه) دەڵێت:(ولم يسجل تأريخ الدولة الإسلامية على اختلاف عهودها حادثة اضطهاد دينى واحد.)[657] ئەگەر یەکجار واش نەبووبێ وانەبوە وەك دوای تارومارکران ،بەلام لەسەرەتای سەدەی نۆزدەڕا بەرەبەرە تەیاری تەغریبی لەناو عوسمانی سەری هەڵدا، ساڵی 1865 عوسمانلی لاو دروست بوو، ساڵی 1889 اتحاد وترقی دروست بوو، ساڵی 1908 ئینقلابیان کرد لەسەر دەوڵەتی عوسمانی، ساڵی 1909 سوڵتان عبدالحمیدیان بەتەواوەتی دابڕی محمد رشادیان هێنا ئاگای لەهیچ نەبوو ، تەنها چەترێك بەناوی عوسمانی مابوو، دەنا اتحادوترقی کە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی تۆرانی عەلمانی فەرمی بوو ئەوان حوکمیان دەگێڕا، لە بەڵگەنامەیەك هەیە کە سوڵتان نامەیەکی بۆ زانایەکی عەرەب بەناوی (ابو شامە) دەنێرێت، تیایدا دەڵێت کە (انور پاشا) بڕیاری بەشداری کردنی جەنگی جیهانی یەکەمی داوە، نە ئەو نە شێخ الاسلام ڕایان لەسەر نەبووە، لەراستیدا لەوکاتی خەلیفە وەکو رەمزێك بووە وەك ئەوەی ئیستا پێی دەووترێ مەلەکی دەستوری، ئیتر ئەوکوشتارەی ئەرمەنی لەسەردەمی اتحادوترقی کرا..، نە دەسەلاتی عوسمانی مابوو نە سوارەی حەمیدیش مابوو ، سوارەی حەمیدی لە ساڵی 1909 هەلوەشایەوە لەسەر دەستی اتحاد والترقی لە جیاتیان جۆرێك لە فەوجی خەفیفە دروستکران، لەوانەیە ئەوانە بەشدارییان لەجەنگی دژ بەئەرمەنیەکان کردبێت، هەروەك دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان کۆمەلیك تاوان بار دەستگیرکران لەلایەن بریتانیەوە بە تاوانی جینۆسایدی ئەرمەن دوو کوردی تێدا بوو ،(پرنچی زادە فەوزی) و (تیگرل بەگ زولفی بەگزادە) لەساڵی 1919 لەکەمپێکی بریتانی دەست بەسەر کرابوون،ئەو دەستگیرکردنە لە چوارچێوەی دەستگیرکردنی کۆمەلێك نوسەروڕەوشەنبیری تورك کرا کە هاندەری ئەو تاوانە بووینە ،هەرلەو سەردەمیش وەك بەرواری 13 ی تشرینی دوەمی 1919یەکەم جار ئەو باسەی جینۆسایدی ئەرمەن بەتوندی هاتە کایەوە ،ئەو دوو کوردەی کە دەستگیرکران نوێنەری دیاربەکر بوون لە پەرلەمانی تورکیادا هەردووکیشیان دوژمنی هەرە گەورەی خودی کوردیش بووینە،ئەوانە دوای ئەوەی ئازاد کران لەلایەن بریتانیاوە بەگەر عیسمت ئینینۆ کەوتن وکۆنگرەی لۆزانیان دژی کورد مۆرکرد.

---

[657] ه س ص 174

هەرلەدوای جینۆسایدەکەو ڕووخانی ئیتحادیەکان و ناسینی ئەوتاوانە لەلای تورکیا دەست بەو تەقەلایە کرا کەبیخەنە ئەستۆی کورد ، علی کمال بەگی وەزیری ناوخۆی دوای ئیتحادیەکان (لەسالی 1919)دەلێت ئەو جینۆسایدە ئیتحادیەکان پێی هەلسان بنکەی سەرەکی ئیتحاد بوو، ئینجا دەلیٚ ئەو تاوانە گەورە بوە بۆچی یەخەی هەندێك فەقیروهەژاروکارمەندی دیاربەکرو سیواسەخاربووت دەگرن کەچی والیەکان ناگرن کەتاوان باری بنچینەیین،لەوەوە بە ئاشکرا هەست پێدەکرێت تورکیا ویستویەتی لەو کاتی ئەو تاوانە لە ئەستۆی کوردبشەتێنی ،لە ئاستی دەولی یەکەم جار عیسمەت ئینینۆ لە کۆنگرەی لۆزان هەولیدا کوشتاری ئەرمەن بخاتە ئەستۆی کوردە نەك تورك، لەو کاتیەوە تائیستا تورکیا دەیەوێ لەئەستۆی خۆی دابڕینی وبیخاتە ئەستۆی ئەولاوئەملا ،

ئەوەی یارمەتیدەری ئەو تەقەلایەی تورکیا بوە چەندان مێژوو نوسی کوردیش (بە بێئاگایی یان بە ئاگایی ) نوسیویانە : سەربردە دروستکراوەکانی تورکیایان دووبارە کردۆتەوە ،شەرمەزاریە بۆ کورد کە بەشداری لەو کوشتارگەیە کردووە...، ڕاستیەکەی وانیەکورد وەك دەسەلاّتێکی سیاسی، یان بەشێك لە بزاڤی رزگاریخوازی کورد، بەشدارییان نەکردووە، ئەگەر بلّێن چەندکەسێك لەسوپای ئیتحاد و تەرەقی کە کورد بوون بەشدارییان کردووە، ئەوا لە ئەنفالی ئێستای کوردستانیش چەندەها لەوانەی بەشداری ئەنفالیان کرد کورد بوون، زۆر لە مێژوونووسان لەژێر کاریگەری ڕابوونی مارکسی و زالیەتی فەرهەنگی ڕۆژئاوایی ستاندەری بیرکردنەوەی عەقلی کوردی زۆر لار کرایەوە، مێژوونووسی گەورەی کورد کەمال مەزهەر لە کتێبەکەی (کوردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی) لەباسی کوشتارەکەی ئەرمەندا واپیشان دەدا کە کورد کردوویەتی ،وایان پیشان داوەهەموو کوردێك بلّیٚ ئێمە ئەرمەنمان کوشت، داوای لێبوردنیش دەکا..چەندین سەرکردەی تری کوردستانی باشورو باکووڕو ڕۆژهەلات بە خۆڕایی ئەو داوا(لیبوردنەیان) کردوە،کە مانایاسایی وسیاسی وقەرەبوویی قوڕس دەکەوێتە سەر کورد،دەتوانن داوای ئەو ناوچانە بکەن کە لە نەخشەکە هاتوە. کەچی ئیستا دەرکەوتوە بەو شێوەیە نیە، نووسەرێکی ئەمریکی بەناوی (ستیڤان شۆ) کە زمانی تورکی دەزانیٚ لەسەر ئەرشیفی عوسمانی ئیشی کردووە، پیشانی دەدا کە کوشتاری ئەرمەنیەکان بەدەستی سوارەی حەمیدی نەبووە، لە 1908 مێژوویەکی تازە دەست پێدەکات لە دەوڵەتی عوسمانی، ئەویش

ئینقلابی اتحادیەکان بوو، ئەوە دوورە لەوەی ئەو کارەساتە بە ئەستۆی کورد کە هیچ دەسەلاتێکی نەبوە ،تەنانەت عوسمانیش دەسەلاتی نەبوو بەلکو ئیتحادولتەرەقی بوە ،کە حزبێکی عەلمانی - فاشی و تورك پەرست بوون و ئیمانیان بە مەرکەزیەت بووە[658]، لەبەرنامەیان بوو هەموو نەتەوە غەیرە تورکەکان بکەنە تورك، ئنجا لە کورد دەدەن دوایی لە ئەرمەن دەدەن..پاش وپیش کرا یەکەم جار لە ئەرمەن درا ئینجا لەکورد درا خۆ لەمیلەتانی تری عربی و سریانیش درا، ئیحسان نوری پاشا لەکتێبەکەی خۆی (شۆرشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا) دەلێ تورکەکان لە کاتی لێدانی ئەرمەنەکان دەیان گووت با لە (زۆ زۆ- ئەرمەن)تەواو بین نۆرەی (لۆ لۆ- کورد) دێت[659] ،ئەوەی کەمێك بەلگەنامەیە کە ئیدارەی عوسمانیش بەشداری کردبێت لەو تاوانانە بەلگەنامەیەکی وەلامی سعیدحلمی پاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی (سەرۆك وەزیران) بۆ سکالانامەیەکی (ئوسقوفی گەورەی ئەرمەن لە ئوستانەلە رۆژی 1915/4/11 ) هاتوە(ئیوەی ئەرمەن پیش شەڕخەریکی جودابوونەوە بووینە لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی)—دوای سعیدپاشا تیرۆر کرا بەدەستی ئەرمەن ،هەروەهالەگوتاری (لۆردپرایس بۆ ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانی)دەلێت سولتان عبدالحمید ووتویەتی (چارەسەری کیشەی ئەرمەن رزگاربوونە لە خودی ئەرمەن) ،حکومەت ووەزارەتی عوسمانی لە چاو دەسەلاتی ئیتوحادتەرەقی زۆر لاواز بوو .

**کورد بەشدارنەبوە (بەلگەکان)**: گەلی جار ناوی کوردو عەرەب ولاس و ئەلبان وزۆر لای تر دیت کە بەشداربووبن ،بەشداری راستەقینە ئەوەیە بە فەرمی سەرکردەکان فەرمانیا دابیت ،کەچی وانەبوە ..وەك لەو خالانە دەردەکەوێ:

- لەلای ئەرمەنی ولەلای هیزەکانی هاوپەیمانان لیستیك لە ناوی سەرکردە تاوانبارەکان سەبارەت بە جینۆسایدی ئەرمەن بلاوکرایەوە ، ژمارەیان 1397 کەس بوو هەمویان لە ئیتحادیەکان بوون ،ئەنوەر پاشاو جەمال پاشا و تەلعەت پاشا زۆر سەرکردەی تریان فەرمانی تیرۆریان لەلایەن ریکخراوی تاشناقی ئەرمەنی(کە دامەزرینەرەکەی کریستۆفەرمیکائیلیانەلە 1890) دەرچوو دوایش کران ،یەکەم جار ئەنوەرپاشایان لە تاشقەند تیرۆرکرد(سەربرین)بەدەستی (ئاگابیگۆف)،جمال

[658] بروانە وەسیەتەکانی مدحەت پاشا : الباحث-الاسلام والعلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص71 .

[659] احسان نوری پاشا– شۆرشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا ل20 .

پاشابەدەستی هەردوو گەنجی ئەرمەنی(پەترۆس وئەرتاشیس)،خانخویسکی سەرۆك وەزیرانی ئازەربیجان بەدەستی ئارام پەرگانیان،بەهبودخان وەزیری ناوخۆی ئازەربیجان لە ئەستەمبۆل بەدەستی (میساك تۆرلاكیان) تیرۆركرا،عباس بیگۆڤ بەدەستی (یارگانیان)تیرۆر كرا،تەلعەت پاشا لەبرلین بەدەستی (سۆقۆن تەهلیریان)تیرۆركرا، شاكیرپاشا وعەزیم پاشاهەربەدەستی ئارامیەرگانیان پێكەوە كوژران، سەعیدحلمی پاشا لەئیتالیا بەدەستی (ئەرشاویزشیراگیان) تیرۆركرا،لەلایەكی تر (كمال بەگ)تاوانباریكی گەورەی بكوژی ئەرمەن بوو خۆی ووتبووی 60000ئەرمەنیم كوشتوە ،سوپای هاوپەیمانان دەستگیریان كردو گولە باران كرا،..دەبینین لەو لیستە ڕەشە ناوی سەركردەكانی كوردی تیانیەو كەسیسشیان تیرۆر نەكرا، تەنانەت بۆ سولتانەكانی عوسمانیش دەرنەچوو، دەلێن تەقەلایەكی تیرۆر بۆ سولتان عبدالحمید كراوە لەلایەن تاشناكی ئەرمەنی وریكخراویكی شۆرشگێری ماكدۆنی بەلام ئەوە پیش جینۆسایدی 1915 بوە ،بە پیچەوانەوەهێزێكی زۆری كورد چوون بۆ داكۆكی كردن لەو ئەرمەنانەی گیانیان لەمەترسەو بووەبەتایبەتی لەباشووری كوردستانەوە ، كورد بەشداری لە رزگاركردنی چەندەها بنەماڵەی ئەرمەنیدا كردووە.

- هەمو بەرپرسەكان وەك یەك نەبوون ئەوەی زۆر توندبوو خزمەكانی (ئەنوەرپاشا)پێی هەلدەستان ،لەكوردستان بەباشی فەرمانی قڕكردنی ئەرمەنی نەدەكرا بۆیە (جەودەت بەگی)خەزووری ئەنوەرپاشا هاتە وان وئەو كارەساتانەی ئەوێی كردو ئینجا گوازرایەوە بۆ مووش ئینجا بەتلیس دوایش شام تالەویش ئەو فەرمانانەی ئیتحادیەكان بەباشی جیبەجێ بكات .لە راپۆرتیكیرۆژی 1908/9/30 (مستەر دیكسۆنی)كۆنسۆلی بەریتانی بۆ(جیرالدلۆسەر)ی بالویزی بەریتانی لەئەستەمبۆل دەلیت ئەوەی زۆر دژایەتی ئەرمەن دەكات لە شاری وان ئەوا ئەو چەند فەرمانبەرو بەرپرسە توركانی ئیتحادیەكانن(باشپۆزوخ) .
- واپێدەچی ئیتحادیەكان زیاتر لە ئەرمەنی دەوروبەری كوردستان زیاتر تووڕە ترن بە پیی ئەوبروسكەیەی وەزیری ناوخۆ تەلعەت پاشا بە ژ:619ی رۆژی 22 /1915/11 تیایدا دەستوری كوشتنی هەمو ئەرمەنیەكی رۆژهەلات داوە لەهەر شوێنێك بینران.
- ئەو ناوچەیەی ئەو كوشتارەی لێكرا لەژێر دەستی اتحادوالترقی بوو، ئەرمەنیەكان هەڵاتن بەرەو ئەو ناوچە كوردیانەی دەسەڵاتی اتحادوالترقی تێدانەبوو، لەوێ حەوانەوەو تائێستاش ماون.

بەلگەی زیندووی تر ئەوەیە لەباشووری کوردستان کە تائێستاش ئەرمەنی ومەسیحی هەیە ڕووبەڕووی هیچ تەنگەبەریش نەبوویتەوە ،نەك لەشار بەلکو لەگوندەکانیش خاوەن مولك بووینە تا ئەو ساتەش ،بە برادەرایەتی نیوان ئەرمەنی وکورد وتراوە (کرییڤ)، گۆرانی ولاوکیکی زۆر هەیە ووشەی کریڤۆی تێدایە ، ئا لەو کاتەی کە ئەرمەنی لە ژێر دەستی ئیتحادیە تورکپەرستەکان دەکرا لەوکاتە هەلس وکەوتی سەرکردە کوردەکان شیخ عبدالسلام بارزانی بە شیخ النصرانی بەناوبانگ بو، کاهینێکی گەڕیدە هاتبوە کوردستان وسەردانی ناوچەی بارزان وکوردستانی کردبو سەرسام بو بەوتەباییەی نێوان کوردستانیەکان لە ئاینە جیاجیاکان کتێبێکی نوسیبوو بەناوی(مهد البشریە ـ الحیاه فی شرق کوردستان) شیخ عبدالسلامی بە(برایان بۆرۆ)ی ئیرلەندای شوبهاندبوو، کە لە کوردستانیش لەژێر سایەی ئەخلاقی ئاینی وەقە زێڕەك لەدەرەوە بەجێ بهێلە کەس دەستی بۆ ناباو، مالی مەسیحی زیاتر پارێزراوبوە[660]، شیخ عبیداللەی نهری جێی سەرسامی بیانیەکان بوە ،رۆژنامەی (کوردستان) ژمارەکانی ( 26 و 72 ی 3/4 /1901 ) شانازی بەوە کردوە کە شیخ عبیدالله لە کۆنگرەی کوردستانی 1880 رەتی کردۆتەوە کوردبەشداری لە هەلمەتی دژبە کەسانی ناموسولمان لەناوچەکە بکات و ووتویتی ئیمە نابینە ئامرازبەدەست کەس بۆ تاوان وزولم ، بەلگەنامەیەکی زۆری تری ئەرمەنی وڕووسی هەیە کە کوردەکان بووینە هۆی رزگارکردنی ئەرمەن ،تەنانەت لەزۆر شوین تووشی شەڕ بووینە لەگەل هیزەکانی ئیتحادوتەرەقی (کەلەو سەرچاوانە بە عوسمانی ناوی بردوون)[661] .

---

660- أیوب بارزانی –المقاومة الكردية للإحتلال ص8 هەروەها بڕوانە ئەو ڕووداوەی یارمەتی ئەرمەنەکان لەلایەن سەرکردە ئاینیەکانی کورد لە ل264ی مسعود بارزانی-بارزانی وبزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد.

661 بۆ ئەو ڕاستیانە تەماشای ئەو سەرچاوانە بکە :(یەکەم – محمد خليل أمير ، علاقة الكورد بمذابح الأرمن ، ص 258 ، دوەم –122 V- A – cardlevski- op-ctt-vol-111-p . L BID-pp-105––3 . سێیەم– Nuri Dersim – kurdistan Tarihinde Dersim-s-112-114 ئیستا تەرجەمەی کوردیش کراوە، چوارەم – M .s- Lazarev – kurdistan – pp- 57-67-312 . پێنجەم– مقبس من كتاب .ك.ن. يوزباشيان يوسف أبكاروفيج أوربللي ، موسكو ، 1964م ، ص 33 – 34 . شەشەم– Harry Charles Luke-Mosal And its Mimorities-London 1925- p-12q . حەفتەم–استراجيان (مغامرات في تركيا وروسيا) .

- ئەگەر ڕاست بوایە کورد بەشداری لەو جینۆسایدە بوایە ئەوا لە ئەرمینیای ئێستاش پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن خوێناوی دەبوو، بەڵکو زیاتر دۆستایەتی بووە، هەر بەم دۆستایەتیە دەتوانێت مێژوویەکی راستی دوور لەو هەڵبەستانە بۆخۆی دابڕێژێت.
- دوایی دوو سی رێکەوتنی گرنگ لەنێوان بزوتنەوەی تاشناخ و بزوتنەوەی سیاسی کورد کرا .
- وەفدی هاوبەش، شەریف پاشاو بۆغس پاشا پێکەوە بەشداری کۆنگرەکانیان دەکرد، واتە گرفتێکی وا لەنێوان کورد و ئەرمەنی نەبووە،
- لەراستیدا ئەرمەنەکان خۆشیان لە چەندلایەکەوە هەندێ تاوانیان دەکەوێتە ئەستۆ ،لەلایەك یارمەتی ئیتحادیەکانیان دا دژی عوسمانی ،لەلایەکی تریش بەگەر سوپای روس کەوتن دژی موسولمانان ، چەندین جار بەشداربوونە لە کوشتاری کورد، لەگەڵ سوپای روسیا هاتن(دەووترا حروس هاتن) زۆر لە اتحاد والترقی خراپتریان بەکورد کرد،سوپای رووس لە 13/5/ 1916 گەیشتە کوردستانی خواروو ویرانی لەگەل بوو بە یاوەرانی ئەرمەن،بەتایبەت ئەوەی کە لەناوچەکانی رواندوز رووی دا، بە پێی هەندێ سەرچاوە دەستیان لە منداڵیش نەپاراستووە،واباو بوە گوایە مەمکی ژنانیان بڕیوە بۆیە کۆچڕەویەکی بە کۆمەل لەپیش سوپای ڕوسیا کراوە وتا ئیستاش ئەو کۆچبەرانە پێیان دەووترێ مهاجیرلە کوردستانی باشور، هەر بەو هۆیەش بوو شیخ محمود لە بەرەکانی شوعەیبە گەڕابۆوە کوردستان ،واپێدەچی سوپای روس دڕندانە تر هەلس وکەوتی کردوە بۆیە ناوبانگی خراپ رۆیشتبوو ،بە سوپای کافرو فەلە ناوزەد دەکرا ،هەربۆیەش لەبەرامبەردا ئامادەباشیەکی گشتی کوردی دژی کراوە ،هەتا ئافرەتیش هاتۆتە شەڕ ،لە چەندین سەرچاوە ناوی (قەرە فاتیمە)دێت کەسەرپەرشتی هیزیکی 500سواری کردوە بۆ ئەو شەڕە .
- بزوتنەوەی داشناق ئەرمەنی بوو، زۆربەی چالاکیەکانی ئەو هێزە چەکدارانە دژی گوندە کوردییەکان بوو، بۆیە سوڵتان عبدالحمید هەڵسا بە دروستکردنی "سوارەی حەمیدییەکانی" لە کورد،بەشێك لە ئەرکیان بۆ رووبەرووبونەوەی ئەو مەترسییەی ئەرمەنییەکان،دوای لە 1908 سوارەی حمیدی هەلوەشایەوە وفەوجە سوکەکان لەکورددروست کرا لەلایەن ئیتحادوتەرەقیەوە ،نکولی ناکری ئەوانە بەشداری ئەو تاوانەیان کردوە بە فەرمانی ئیتحادیەکان .

- له ڕاپۆرتی ویلایەتی موسل باس له کوشتاریەکی کورد دەکات لەسەردەستی ئەوئەرمەنانەی لەگەل هیزەکانی روس هاتبوون له پایزی 1916،دەلیٚ زۆربەی کوژراوەکان ژن ومندال بوو له دەربەندی رواندوزفرێ دەدرانه خوارەوه[662] .

- له کیشەی ولایەتی موسل وله ئال وگۆڕی یاداشتەکانی نێوان لۆردکیرزن وعصمت ئینینۆهەردوو لابه ئاشکارا باسی هیزی سەربازی تورکیا دەکەن له کوشتاری ئەرمەن باسی کوردی تیدا نیه ،بەپیچەوانەوه ئەرمەن ومەسیحیەکان هەلاتونه ناوچەی کوردەکانی خواروو کەدەستی تورکی پێنەگەیشتوه[663] .

- له ڕاپۆرتی ولایەتی موسل هەلویستی کوردبەرامبەر مسیحیەکان بەگشتی زۆر بەنمونەیی ودەگمەن وەسف دەکات.[664]

- به ڕوون تر له مادەی (3)ی ریکەوتنامەی تاشناقی وخۆیبوون )ی 1927/10/29باس لەو تاوانبارانه دەکات که به جینۆساید هەلسامن پەنجه بۆ (تورکه تۆرانیەکان وتورکیای نویٚ وئیتحادو ترقی)دەبا .

- له ڕاستیدا لەو دۆخەدا لەیەك کاتدا کورد دژی ئیتیحادیەکانیش بووینه دژی ئەرمەنیش بووینه ،دژی ئیتحادیەکان چونکه بەرنامەی جینۆسایدی ئەرمەن وکوردو خەلکی تریشیان هەبوه ،دژی ئەرمەنیش بووینه بەهۆی ئەوەی پرۆژەیەکی هاوبەشیان لەگەل روس هەبوه بۆ داگیرکردنی کوردستان [665].

- رۆلی کورد له جینۆسایدی ئەرمەن (به سەلبی وئیجابییەوه)هەبوه ،بەلام ئەوەنده شەرمەزاری نیه ،چونکه ئەگەر هەندێك کریگرتەو چاوچنۆکی تالان بەشداریان کردبیٚ بەهەزاران دەسەلاتداری

---

[662] ولاية الموصل- تقرير لجنة عصبة الامم ..ص115
[663] ولاية الموصل- تقرير لجنة عصبة الامم ص205
[664] د.فاضل حسين - مشكلة الموصل .- ص98
[665] مذكرات جمال ثاشا ج1ص481

کوردی ئەرمەنی رزگار کردوە ئینجا لەهەموی گرنگ تر سەرکردە کوردەکان فتوای حرامی کوشتن وئەزیەتی ئەرمەنیان دەرکردوە ،لەهەموان روون تر شیخ سعیدی پیران —کەلەدوای دەبیتە سەرۆکی شۆرشی،ئەوە دەقی فتوایەکەیەتی (هەرکەسیك ئەرمەنیەك بکوژی وەك ئەوەیە موسولمانیکت کوشتبیت، داواتان لیدەکەم بیانشارنەوەو رزگاریان کەن لەچەنگ دوژمنکارانی تورکیان ،هەردەستدریژیەك بۆیان حەرامە)[666]،لەوانەی ناویان هەیەو کورد رزگاری کردون بکوژەکەی تەلعەت پاشا لە برلین (تەهلیریان) لە دادگاییەکەی دەرکەوت کورد رزگاریان کردوە ،جاریش وایە بەهەلەیی وتیکەلی کورد تێوەگلیندراوە ،لە یاداشتەکانی (جمال پاشا)ناوی (کۆمەلەی محمد)ی تیا هاتوە کە بەشداری کردبیت کەچی ئەو بەشداری دژی ئیتحادوتەرەقی کرد کە نابیت خەلافەت بڕووخێ ئینجا ئەو کۆمەلەیە(کۆمەلەی محمدی بەسەرۆکایەتی درویش وحدتی بوە کە لەدوای رووداوەکانی 31ی ئاداری 1909 لەسیدارە درا)[667] جیایە لەگەل ئەوەی نەورەسی (یەکیتی محمدی) ،تەنانەت هەندێ میژوو نوس نوسیویانە ئەرمەن بوە کۆیلەو دەکران ودەفرۆشران ..هەموی بۆ کۆیلایەتی نەبوە بەشیکی زۆری ئایندارانی کوردو خەلکی تریش دەیکڕینەوە بۆ رزگارکردنیان چونکە فەتوای وا هەبوە ئەوانە بکڕنەوەو رزگاریان بکەن لە کوشتن لە حەج باشترەو پارەی حەج بەوانە بدەن ،هەریەکە لە لازاریف ومستەفاپاشا مامۆلکی وهۆفنسیان وچاتچاتکیان وزۆری تر ئەرمەنە رزگرارکراوەکان بەدەستی کورد دەگەینە 200000ئەرمەنی .

لە کۆتایدا بە ئاسانی دەردەکەوێ کە ئەو جینۆسایدەی دژ بە ئەرمەنی کرا نە کورد بووە نە عوسمانی،نەعەرەب ونەچەرکەس ..بەلام ئەوانەشیان بەکارهێناوە ،ئەوەی زیاتر ساغ بوویتەوە هەندێ عەشایەری کوردی بۆ تالان جارجار بەشداریان کردوە،ئەوەی پیهەلساوەئیتحادالترقی بووە ، کە دوایی ئەو تورکیایە نوێیەی لێدروست بوو،وەك بەلگەنامەش علی کمال بەگی وەزیری ناوخۆی دوای ئیتحادیەکان (لەسالی 1919)دەلێت ئەو جینۆسایدە ئیتحادیەکان پێی هەلسان ، کلیمنسۆری

[666] دەقی ئەو فتوایە لە (الکورد والمسألە الارمنیە- هووکر گاهر)وەرگیراوە ئەویش لە (Hessen heshyar)ی وەرگرتوە .
[667] مذکرات جمال باشا-اعداد:محمدالسعیدی ج1ص30 وص70

سەرۆك وەزیرانی ئەوسای فرنسا بە ناوی (ئەنجومەنی بالای ئاشتی) لە رۆژی 1919/5/25 ووتی بەلگەنامەی فەرمیمان دەستکەوتوە (ئەوانەی تەلعەت پاشا) کە تورکیا بەفەرمی بەو کارە هەلساوەو تورکیای ئیستاش خۆی دانی بەوە هێناوە ،هەربەبۆنەی ئەو جینۆسایدە کلیمانسۆر بە ئاشکرا تر ووتی تورك شایەنی ئەوەی نیە میلەتی تری لەژێر دەست بیت (ئێکەفائەتە)، لەمادەی (142)ی سیڤەر بەهۆی کوشتاری ئەرمەن و بەشداری جەنگی جیهانی دەسەڵاتی ئیتحادیەکان بە (تیرۆریست) تۆمار دەکا، ئینجا قەرەبۆش دەخاتە ئەستۆی، هەر هەموو ئەوانە لەمادەکانی (231-257) سیڤەر- سەبارەت بە تورکیا هاتوە، کەچی لە بەشی سێیەمی کوردستان هیچ باسێکی بەرپرسیارێتی لەو تاوانەی تێدا نیە.. ئەوەش بەڵگەیەکی تری سەربارە کە کوردستانی فەرمی بەشدار نەبووە لەو تاوانە هەروەك بەشێکی گرنگ لە مێژوونووسان و سیاسەتمەدارانی هاوچەرخی کوردیش بە هەڵە ئەو بەرپرسیاریەتیە لەسەر تورکیا لادەدەن و دەیخەنە ئەستۆی کورد و یارمەتی تورکیای پێ دەدەن.
لە رەئسولعەین زەکی بەگ چەرکەس وعەشایرە عەرەبەکانی هێناو پێی ووتن هەر ئەرمەنیەکتان کوشت جل وبەرگەکانیان بۆخۆتان بێت وئیتر بەو هۆیە زۆریان کوشتن ،ئەوانە هەموی مانای یەك بەرپرسیاریەتی تاوانەکەیە ئەویش فەرمانڕەوایی ئەوسا جا عەرەبی بەکارهیناوە تورکی بەکارهێناوە کوردیشی بەکارهێناوە،خۆ لە ئەنفالی کوردستان بەدەستی بەعس (77)فوجی خەفیفەی کوردبەشداری کردوە بەپێی دادگای عیراقی،ئاواش بەشداری جینۆسایدی ئەرمەنی کراوە .

<u>بەلگەنامەکان</u> : بیجگە لە شایەدەکانی بەچاو بینیویانە و بەلگەنامەودانپیاهێنانی علی کمال بەگی وەزیری ناوخۆی دوای ئیتحادیەکان (لەسالی 1919) کەدەلێت ئەو جینۆسایدە ئیتحادیەکان پێی هەلسان ، هەندێك بەلگەنامەی دوورو نزیك هەیە هەندیکیان دوورەو وەسفی تاوان وکارەساتەکانی کردوە لەو سەردەمی ، بەشەکەی تر نزیك وگرنگن بریتین لە بروسکەو ڕێنماییە نهینیەکانی دەسەلاتدارانی عوسمانی کە ئەو کاتی ئینحادوتەرەقی زال بوونو بەسەرکردایەتی (ئەنوەرپاشاو جمال پاشاو تەلعەت پاشا)، زۆربەی ئەو بەلگەنامانە میژوونوسی گەورەی بریتانی (ئەرنۆلدتۆینبی)کۆی کردۆتەوە،هەروەها ئەرشیفی تری بەریتانیا بەناوی (کتاب الازرق)لە ئەنجومەنی لۆردات ،یەکەم بروسکەی نهێنی گرنگ لەلایەن ئەنوەر پاشای وەزیری جەنگ نێردرا ، بەلگەنامە بە ژ:2001ی

رۆژی 1915/2/29 لە سەرکردایەتی گشتی جەنگەوە بە مۆری ئەنوەر پاشا دوای دوو بروسکەی نهێنی تری ڕێنمایی بە قڕکردنی ئەرمەنی دەدا،ئینجا بروسکەی تەلعەت پاشا وەزیری ناوخۆ بەردەوام ڕێنمای ناردوە بۆ ویلایەتەکان ،هەرە سەختیان بروسکەی 1915/3/9 داوادەکات ئەرمەنی قڕ بکەن ومندالی شیرە خۆرەشیان نەهێلن ،تەنانەت لە بروسکەیەکی تەلعەت پاشا بە ژ:537 یرۆژی 1915/9/29 هاتوە کە ئەو موسولمانانەی ژنی ئەرمەنیان خواستوە ئەوانیش بەگەر ئەو بڕیارەبدەن وبیانگوازنەوەبۆ بیابان و بەرەو مەرگ، ڕوون ترین بەلگەی مەترسیدار لەلایەن وەزیری ناوخۆ تەلعەت پاشا دێت بە ژ:619ی رۆژی 22/ 1915/11 تیایدا دەستوری کوشتنی هەمو ئەرمەنیەکی رۆژهەلات داوە لەهەر شوێنێك بینران ، بەبروسکەی ژ:603 ی رۆژی 1915/11/5 بە فەرمانی وەزیری ناوخۆ(تەلعەت پاشا) دەلێت ژن ومندالی ئەرمەنی لەکوردستان(سیواس-مەعمورە عزیز-دیاربەکر-ئەرزەرۆم)دالدە دراون بەناوی خزمەتکاری دەست بەجێ هەمویان کۆکەنەوەو بۆ بیابان با تۆبڕاو بن، ئەوەی زیاتر مانای جینۆسایدی وەرگرتوە ئەو دوو بروسکەیە ی ئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشا، نوسراوی رۆژی 1915/9/16 لە ژێر ناوی(هەموان بکوژن)بە مۆری تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ،دوای لە بەرزترین دەسەلاتی عوسمانی(ئیتحادیەکان)بە نوسراوی فەرمی ئەنوەرپاشا لە رۆژی 1918/2/27 فەرمانی کوشتنی گشتی دەکا لە 3 مادە ،یەکەمیان کوشتنی ئەرمەنی 5سال بەسەروو،لەمادەی دوو کوشتنی هەمو سەربازو پلەدارەکانی ریزی سوپای عوسمانی گرتەوە ،لەوەوە مانای جینۆسایدیش وەردەگرێ،..

بە ئاڕستەیەکی تریش هەمو عوسمانی وهەتا هەمو ئیتیحادیەکانیش بەشدارنەبووینە ،هەندێك لەو بەرپرسانەی یاخی بووینە لە جیبەجێکردنی ئەو تاوانە ،لەوانە نەعیم بەگ کە تۆینبی زۆر پالپشتی کردۆتە سەر بەلگەنامەو یاداشتەکانی ،بە ڕاشکاوانەش جلال بەگ لە حەلەب بەبروسکە وەلامی تەلعەت پاشای دایتەوەو ووتویەتی(من فەرمانڕەوای ئەوویلایەتەم نەك جەلادی ویلایەت) ،دەست بەجێ لەکارلادراوە ،فوئادپاشای دلی (کاندیدی بوە بۆ سەدری ئەعزەم)زۆر بەتوندی دژی ئەو جینۆسایدە بوە ، لە ڕەئسولعەینی شام باس لە (یوسف زیا بەگ)دەکریت وووتویەتی من بەشداری تاوانی واناکەم هەروەهاش علی سعود بەگووتویوتی عارەبانە ئامادە نیە تا بیانگوازمەوە و

ناشیانکوژم ،بۆ جێی ئەوانە جەودەت بەگیان هێناوە ئەو بێبەزەیی بوە ،دوای تەلعەت پاشا بە فەرمی بروسکەیەك دەنێری لە رۆژی 1915/9/15 هەرەشە لەهەمو ئەوانە دەککا کە بەزەییان بە ئەرمەن دێت وڕێنماییەکانی قڕکردن جێبەجێ ناکەن ودەلێن دەبێ هەمویان سزا بدرێن ودەربکرێن ،لەبروسکەیەکی تری زۆر توند دەلێ هەر مالە موسولمانێك ئەرمەنی دالّدە بدات وەك ئەوان هەژمار دەکرێت ، لەگوتاری (لۆردپرایس بۆ ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانی) ئەو ڕاستیەی دووبارە کردۆتەوەو دەلێ بیستوومە دوو قایمقام کاری کوشتاری ئەرمەنیان جیبەجێ نەکردوە هەردووکیان لادراون وخەلکی دلرەقیان هێناوە جێیان .

+ئەو بەلگەنامانە زیاتر لە کتیبەکەی (تۆینبی – جینۆسایدی ئەرمەن –وەرگێرانی د ابوبکر خۆشناو) وەرگێراوە .

<u>تورکیا نکولی دەکا :</u> دەلێن چەندێك ئەرمەن لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی کوژراوە، ئەوەندەش کورد و تورك کوژراوە، دان پیانان بەو کوشتارگەیە مانای هەموو میللەتی تورك و واقعی ئەمڕۆیان دەگرێتەوە، کە ئەرمەن خۆیان بۆ هاوارێکی وەك هۆلۆکۆست ئامادەکردووە ،تورك پەرستەکانی ئەمڕۆو بزوتنەوەی تۆرانی لە تورکیا خۆیان بە میراتگری ئیتحادوترقی دەزانن و ئەو فەترەیەیان پێ سەروەریە ،لەلایەکی تر ئەگەر دانی پێدا بنێن هەنگاوی دووەم دانی باجەکەیەتی، بۆیە تورکیای ئێستا دانی پیانانێت. هەرچی حزبی عەدالەوتەنمیە دەلێن مێژوونووسانی ئەمریکاو ئەوروپا لەگەڵ مێژوونووسانی ئێمە بابێن بگەڕێن لە ئەرشیفی عوسمانی بزانن تا چ رادەیەك ئەو کوشتارگەیە روویداوەو کێ بەرپرسە؟ هەرچی تورکە نەتەوەپەرستە تۆرانیەکان و دەسەلاتە سەربازیەکان رازی نەبوون کۆنگرەیەك لە ئەستەمبول لەوبارەوە ببەسترێ، بۆیە حزبی عدالەوتنمیەش پاشەکشەی لێ کرد، تەنانەت کوردیش لەو پرسە هەستیارن ،بەشێك دۆڕاندوویەتی وکوشتاری ئەرمەنی لە ئەستۆی خۆی گرتوە ،بەشەکەی تر دەلێن میللەتی ئەرمەن وەك ئێمە ئەنفال کراوەو زولّمی لێکراوە ، بۆیە دەیانەوی هەر کۆنگرەو پرسیکی ئەرمەنیەکان هەبێ کوردیش بەشداری بکا نەوەك بەهەلەیی بەشێکی بخرێتە ئەستۆی کورد، ئەوەی زیاتر کوردی ترساندوە هەندێ مادەی کۆنگرەی بەرلینی مادەی 16 و61 کە تیایدا باس لەوە کراوە بۆبەرپا کردنی دەسەلاتیکی ئەرمەنی پیویستی بە رازی کردنی

دەسەلاتە کۆمەلایەتی وئاینی کوردستانیش ئاوا لەبەلگەنامەکانی کۆنگرەی برلین هاتوە ،لەوەوە هەست دەکریت بە جۆریك لە جۆرەکان کوردیش دەسەلاتدار بوەو لایەنیك بوە لەکیشەکەی ئەرمەنی، هەندێ سەرچاوە دەلێن ئەرمەنیە سەپانەکانی کورددەکڕان ودەفرۆشران وەك کۆیلە ،ڕەنگە کەمێك ڕاست بووبێت لەو سەردەمی لەماله ئاغاو سەرۆك عەشیرەت رژیمی خزمەتکاریان هەبوە بۆ ژن وبۆ پیاویش ،لە کتیبی(kurdish Question) باسی ڕەفتاری سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان زۆر بەخراپی لەگەل ئەرمەن دەکا لەوەرگرتنی باج وسوغرە پیکردنیان هەتا زیادەڕەویەکی زۆردەکاو دەلێ شەوی یەکەمی بووکی ئەرمەنی دەبوایە لای سەرۆك عەشیرەت بوایە ،کە ئەوە ناکرێ ونابێ ، مەترسی هەیە ئەوانە ساختە بێت بەسەر کوردا چونکە چەندین نوسەری تورك دانیان بەوە هێناوە کە تەرجەمەی کتیبی بیانیان کردوە تیایدا بە خراپی باسی تورك کرابێ یەکسەر ناوی کوردیان لە جیی ناوی تورك داناوە، لە کتێبی (النظام في الأناضول الشرقية ج2) د.ئیسماعیل بێشکچی دەڵێ: نوسەرێکی تورکی کتێبێکی وەرگێڕابوە سەر زمانی تورکی، هەڵسابوو هەر ناوێکی (تورکێك) بە درندە هاتبوو لە هەرجێیەك ناوی تورکەکەی بینیبوو کردبویە (کوردێك).. ، لە چەند ڕاپۆرتێکی تر واهاتوەلە( أرشيف سياسة روسيا الخارجية ، مذبحة الأرمن في الإمبراطورية العثمانية ، مجموعة وثائق ومواد ، يريفان 1966م ، ص 27 – 38 – 82 ،محمد خليل أمير ، علاقة الكورد بمذابح الأرمن ، ص 254 ) هاتوە کە سەربازەکانی ئیتحادوتەرەقی بەرگی کوردیان لەبەر دەکردو تاوانەکانیان دژ بەئەرمەنی ئەنجام دەدا ،

دوایش مادەی(88)ی سیڤەر زۆربەی شارەکانی سەرووی کوردستان بۆ ئەرمەن دیاری کرابوو ،بەشێك ئەوە بە بەلینی بەلفۆری ئەرمەن پۆلین دەکەن ،هەندێ ئاماری ئەرمەنەکان هەیە کە چەند شارێکی کوردی دەڵێن زۆربەی ئەرمەن بووەبە ڕێژەی 75٪ ، هەرچی کوردەکانە دەلێن لە سەدەی نۆزدەهەم لەهیچ شارێك لە 35٪ی تێپەڕیان نەکردوە ، بۆیە ئەو پرسە هەم چاکەو هەم خراپیشە بۆ کورد ،ئەگەر لێی بزانی بە قازانجی کورد دێتەوە ، چونکە لەرووی مێژووییەوە ئەگەر بێتو ئەو پرسە لەسەر تورکیا ساغ بێتەوە، هەمووی لەملی کەمالیزم و ئەو دەولەتەی ئێستادا دێت، چونکە رەگ و ریشەیان لەگەڵ عوسمانی جودایە، دەوڵەتی تورکیا بەپێی ماددەی (10) ی مەبادیئی (14)ی

ویلسۆن ومادەی 27ی سیڤەرو  چوار مەرجەکەی کۆنگرەی لۆزان تورکیای نوێ دروست بووە دریژکراوەی ئیتحادوتەرەقیە نەك عوسمانی[668] .

لەلایەکی دیکەش زیندوو کردنەوەی کێشە سنوریەکان ئەگەری زیندووکردنەوەی کیشەی ویلایەتی موسل و ئەوەی لەنێوان سیڤەر و لۆزان گۆڕا هەموی دێتەوە مەیدان، بەپێی یاسا ناتوانرێ بوترێ سیڤەر هەڵوەشاوەتەوە یان لۆزان بڕیاری لەسەر دراوە، دوور نیە ئەو مناقەشەیە وابکات لۆزان بگەڕێتەوە سەر سیڤەر، لە سیڤەریش بەپێی ماددەی (63) کوردستان دیاریکراوە، بەپێی ماددەی (89) ئەرمینیا دیاریکراوە، بەپێی ماددەی (94) و (132) عێراق دیاریکراوە، هەریەکە بەپێی مادەی جودا رەفتاریان لەگەڵدا کراوە، ئەو ماددانە هەمووی دێتەوە گۆڕێ، بۆیە چاکترین هەلویست بۆ تورکیا نکولی لەهەمو ئەو ڕووداوانەو جینۆسایدی ئەرمەن بکات .

---

[668] هەرچەندە داودئۆغلۆ لە (العمق الستراتیجی ص365)دەلێ تورکیا میراتگری تەواوی میژووی عوسمانیە ..بـەلام بـەدەر لـە ئاخافتنیکی رۆمانسی ڕاست نیە .

(22)

# (قەیرانی عیراق) ازمه العراقیه Iraqi crisis

ئەوانەش دەگرێتەوە( منتفك ،سواد،عراقی عربی وعراقی عەجەمی ،...)

دوای دروست بوونی عیراقی سیاسی لەسالی 1921 ەوە لە چوارچیوەی دیزاینی سیاسی نوێی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دوای کەوتنی لە 2003 نەگەیشتە ئاستی دەولەتی هاولاتی ،سەرەڕای ئەوەش داهاتو ئیمکانیەتیکی زۆریشی هەبوو ،ئینجا هیزیکی زۆری بەکارهینا کەچی لەکۆتایدا دەرکەوت ئەو وولاتە لەڕوەکانی (تۆمارگەی مافی مرۆڤ – شەفافیەت –سیستەمی دیموکراسی- گەشە -..)لە هەرە دواییە ،بەکورتی لە چوارچیوەی وولاتە شکست خواردوەکان(دول الفاشله)پۆلین کراوە ،لەیەکەم رۆژی تەمەنی تا ئەو ساتە ئارامی بەخۆ نەدیوە ، جاران واباوبوو کەتەنها کیشەی کوردی هەیە ،لەدوای 1979 بەدواوە کیشەی شیعەش بە زەقتر سەری هەلدا ،لەسەدەی نوێ کیشەی سونەش سەری هەلدا ئینجا هەمو لەگەل هەمو ،هەرکیشەیەکی زۆر بەزەحمەتی بۆ چارە دەکەی چەندکیشەیەکی تری بە ئاسانی بۆ دروست دەبێتەوە ،بوویتە مادەی تویژینەوەیەکی زۆر بە تایبەتی لەسەدەی 21 ،دەرکەوت هەمولایەك لەگەل هەمولایەك کیشەیان هەیە ، کیشە تەنها لەلایەك نیە لەدام ودەزگایەك نیە بەلکو کیشە لەخودی عیراقە ..،بەو پرۆسە ئالۆزە ووتراوە (قەیرانی عیراق) ،زاراوەیەکی زۆر نوێیە کەمتر کەوتۆتە ناوئەنسیکلۆبیدیاو قاموسەکان .

## سەربردەی ئەو قەیرانە:

لەدوای دروستکردنی ئەو دەوڵەتۆکانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسا، کێشەیەك لە (زانستەکانی مێژوو) پەیدابوو،ئەویش ئەوەیە مەرج نیە میژووی ئەوناوچەیەو میژووی ئەو دەولەتە نوێیانە یەکسان بن، وەك لە تویژینەوەکان یەکسان دەکرین ..، (رۆژهەلاتی ناوەراست) ئەویش ئەوەیە بەپێی ئەمری واقیعی سنوری ئەو دەوڵەتە دەستکردانە پۆلینی روداوەکانی مێژوو دەکەن، واتە چی لە چوارچێوەی ئەو سنورەی ئێستا روویدابێ خستویانە سەر مێژووی سیاسی وڵاتەکە، هەر بە نمونە لەو سنورەی ئێستای عێراق مێژووی بابلی و هیلنسیتی (ئەسکەندەر مەقدۆنی) و ئاشوری و سۆمەڕی و

فارسی و... تا دەگاتە عوسمانی و مەملوکی و کوردی و... ئەوانە نە عەرەب بونە و نە عێراقی، سنوری ئاشوری و بابلی، سنوری میزۆپۆتامیا و وادی رافیدەین، سنوری جەزیرەو ئیقلیم جبل، سنوری سواد و بلاد مابین النهرین... هەموو ئەوانە لێك جیان، هەمووشیان لەگەڵ عێراق لێك جیابووینە، ئەوانە تارِادەیەك سنوری سیاسی بووە بەڵام ناوی عێراق و ئەو سنورە بچوکەی هەیبووە مانای سیاسی هەڵنەگرتوە، لە فیقهی ئیسلامی کە دەڵێ (علمای عراق) مەبەستی عولەمای ئەهلی رەئی کوفەیە، هەر ئەوکاتی زاراوەی (العراقان) باوبوو، کە بریتی بوو لە عێراقی عەرەبی دەوری بەسرە ، عێراقی عەجەمی بە کوفەو سەروەوە دەوترا، وشەی (عێراق) خۆشی فارسیە، خودی ناوی عیراق لە (ئەراك) ی فارس هاتووە بەمانای شاری شاهان[671]، بابل لە باڤیل هاتووە، بەغدا لە باخی داد هاتووە، یاقوت حموی لە (معجم البلدان ) دەڵێ بەغدا هەرموڵکی عەجەم بوە، سامرا لە (سام — ری) هاتووە موصل لەبنەچەدا ناوی (نو ئەردشیر)، حدیسە (نۆدێ) [673]... هتد ، هەموشی لەلایەن عەجەم دروست کراون وەك ئیبن خەلدوون دەڵێ: عەرەب (مەبەستی عەرەبی رِەسەن، بەدەوی) شارستانیان تێکداوەو عەجەمیش بینای کردووە[674]، لە کتێبە کۆنەکان عیراق لەسەر عەرەب پۆلین نەکراوە، ئیبن بەتوتە لە(الکتاب الروض المعطار فی خبرالأقطار) ناوی عیراق لە بلاد العرب تیا

---

[669] ) الصحاح الرازي: مادة العراق، لسان العرب.. ابن المنظور– ج2 ص752، كتاب الروض العطار في خبر الأقطار– ص163، معجم البلدان– ياقوت الحموي– ج2 ص93.

[670] ) بڕوانە: الصحاح، سیاحەتنامەی تورکی، شەرەفنامە، لسان العرب،... زۆر سەرچاوەی تر.

[671]ـ ئەلرازی ـ صحاح ب ـ معجم البلدان ـ یاقوت حموی ج ـ لسان العرب.... زۆر سەرچاوەی تر.

[672] (معجم البادان ج1ص456 )

[673]ـ بروانە (توژینەوەی ماجستیری) بەندە: الاسلام و العلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص 195 ـ200 هەروەها بروانە: ابن بەتووتە، معجم البلدان، ...

[674]ـ بێجگە لە ساسانیەکان هەریەکە لە: ئەکەدی (2334-2154ق.م)، ئۆر( 2112-2004 ق.م)، بابلی کۆن( 2004-1162 ق.م)، ئاشوری (2000-612 ق.م)، بابلی دواتر (626-539 ق.م)، ئەخمینی (539-330 ق.م)، هیلنستی( 331-126 ق.م)، فەرس(227-126) ق.م داگیریان کردوە.

[675]ـ کتێبەکانی: ( معجم البلدان) و (قاموس الأعلام)و (سیاحتنامە) و(شرفنامە) کە لەسەدەی (16)دەرچوە: (اشار الی بلاد الفارس، وجاء فیه انها تشمل: عراق العجم، أذربیجان، أرمینیا، عراق العرب) .

نەهاتوە[676]، لەنامە وەڵامەکەی ئەرستۆش بۆ ئەسکەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئێرانشار وعەجەم دەباوادیارە بەدەستی غەیرە عرب دروست کراون وەك ئیبن خەلدون دەڵێ هەرچی عەجەم لەو ناوچەیە بە شارستانی بینایان کردبوو عەرەب تەرت و وێرانیان کردووە[677] ، یاقوت حەمەوی لە(معجم البلدان )باسی کێشەیەك دەکا لە شاری حیللە لەنێوان کورد و ئەهلی جامیعە باس لەوە ناکا عەرەبی لێبێت،

وشەی عێراق زۆر بەکارنەهاتوەو ئەگەر بەکاریش هاتبێ مەبەستی ناوچەیەکی جوگرافی بچووك بووە لە دەوروبەری بەسرە، لەهەموان رونتر (نەخشەی ئیبن حوقل) سنوری عێراقی دیاری کردووە، ئینجا نەخشەی عوسمانی ساڵی 1892 دیسان کوردستان و عێراقی بەجیا دیاری کردووە،هەر عێراق لە دەوروبەری بەسرایە و کوردستانیش گەورەترە، تەنانەت لە کێشەی ویلایەتی موسڵ لەساڵی 1923-1925 لیژنەی عصبە الامم هاتبوو لە خەڵکی موسڵ تا نزیك سامەڕای پرسی بوو ئێوە عێراقتان دەوێ یان تورکیا، هیچ کەس لەو خەڵکە عەرەبە ناوی عێراقی نەبیستبوو، ووتیان هەرگیز ناوی عیراقمان نەبیستووە[678]،ناوی عیراق لەڕێکەوتنامەکانیش نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی 1923 بۆ یەکەم جار لە مادەی (3)ی دوو کەڕەت ناوی عیراق هاتوە، لەریکەوتنامەی سیڤەر هیچ ناوێکی عیراقی لەبەشە ئینگلیزەکەی نیە ، لەمادەی (94)ی سیڤەر بەناوی (میزۆپۆتۆمیا العربیە) هاتووە(کەچی سێ جار ناوی کوردستانی تیا هاتووە)،لەدوای داگیرکردنی یەکەم جار لۆردکیرزۆن ئەو ناوچەیەی میزۆپۆتامیای ناو نا عیراق[679]،جعفر عسکری (سەرۆکوەزیراندەلیت چوومە زۆر وولاتانی جیهان کە باسی عیراقم دەکرد دەیان ووت عیراق چیە لەکییە دیاربوو نەیان بیستبوو[680] هەر لە رێکەوتنەکانی (سایکس-بیکۆ) 1916، سان ریمۆ 1920، ڤرسای 1919، سیڤەر 1920 ناوی عێراق

---

[676] الكتاب الروض المعطار فی خبرالأقطار ص163مادة: بلاد العرب.

[677] ) بڕوانة: ابن خلدون– المقدمة– ص695.

[678] بروانة : تقريرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركی البريطانی حولة ولاية الموصل ص219 هەروەها (مشكله الموصل–د.فاضل حسين- ص76.

[679] تقرير ولاية الموصل.. ص66

[680] الحكومه العراقيه (وزاره الداخليه)-مجموعه(مؤكرات المجلس التأسيسی العراقی) لسنه 1924م ,مگبعه دارالسلام/بغداد ج1ص37.

نەهاتبوو، خوارووی عیراقی ئیستا بە (میزۆپۆتامیای عربی) هاتبوو،زۆربەی مێژوونووسە عەرەبەکان لە تەرجەمەی ئەو رێکەوتنانە لەجیاتی وشەکانی میزۆپۆتامیا وشەی عێراقیان داناوە.

**راست کردنەوەی هەڵەی باو:**لە زۆربەی نوسینەکان لەبارەی عیراق(وەك پرۆگرامی خوێندنی کوردستانیش) لێی بەهەڵەدا چوونە لەسەر دەستی مێژوونووسە شۆڤێنیەکان ، دەنوسن عێراق لە سەردەمی عوسمانی لە سێ ویلایەت پێکهاتووە، بەغداش مەرکەز بووبێ.. ئەوە هەڵەیە، بەڵکو لە سەردەمی عوسمانی سەرجەم ویلایەتەکان گەیشتە 32 ویلایەت، نەك لە سەردەمی عوسمانی، بەدرێژایی مێژوو (پێش ئەوەی بەریتانیا لەساڵی 1921 بڕیار بدا عێراق دروست بکا). وشەو زاراوەیەك نادۆزیەوە بەناوی دەسەڵاتی عێراقی، ئیمپراتۆریەتی عێراقی، سەرۆکی عێراقی، گەلی عێراقی،...هتد. نەك هەر ئەوە تەنانەت میرنشینێکیش نادۆزیەوە بەناوی عێراق... ئەمانە هەموو لەبەر هۆیەکی سادە، چونکە هەرگیزاوهەرگیز بوونێکی سیاسی نەبووە، تەنها خەڵکی غەیری ئەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەوترێ عێراق هاتوونە لە بەغدا یان لە بابل یان لە مەدائن..، حوکمیان لەسەر ئەو ناوچەیە کردووەو جۆرێك لە شارستانییان بەجێ هێشتوە (وەك لەسەرووباس کرا) ، ناوچەیەکی بێ خاوەنیش بووە بە(ئەیتیما)هەژمارکراوە،لەسەردەمی عوسمانی بە سیبیریاوەسف کراوە ئەو والیانەیان بۆدەناردن کە زیاتر لە نەفی کردن دەچوو... بۆیە هەرچی هاتووە داگیری کردووە، لە مێژوودا زیاتر لە21 جار بەو شێوەیە سانایەی کە ئەمریکا بەغدای داگیرکرد داگیرکراوە، ئینجا لە سەردەمی عوسمانیش ویلایەتێك نەبووە بەناوی عێراق، کەواتە عیبارەتی (عێراق لە سەردەمی عوسمانی سێ ویلایەت بووە) هەڵەیە، راستیەکەی ئەوەیە بەریتانیا لەو سێ ویلایەتە عێراقی لێ دروست کرد، قەیرانی عیراق لەوە دێت هەر دەولەتەکە دەستکردو دروست کراوی مس بیل وبرسی کۆکس نیە بەلکو خودی عیراقیش بەو قەبارە سیاسیەی ئیستای دەستکردە ، پرۆسەی دروستکردنەکەش زۆر بەناوبانگەو یەکەم هەنگاوی لابردنی جیاوازیەکانی نێوان ئەو سێ ویلایەتە لەساڵی 1918 دەست پێدەك[681]، ئەگینا هەر ویلایەتەو وەك باقی ویلایەتەکانی تر جیاواز بووە لەوەی تر، ویلایەتی

---

[681] بڕوانە: نشأه الدولة العراقية– هنری فورستر چ1 ص108.

بەسرەو بەغداش لێك جیابوونە لە بازرگانی و تەرازو و کێش و نەریت و فەرهەنگ، بەسرا زیاتر روو لە کەنداوهند بوون، بەغدا و کەربەلا زیاتر روو لە ئێران بوون، بەغدا زیاتر لەژێر کاریگەری فەرهەنگی یەهودی و مەسیحی لەدوای ئەوانیش فارسی و عەجەمی بوون بۆیە لە بەغدا شەممان پشوو بوو نەك جومعە،[7] ئەوەی مەحاڵە هەرگیزاو هەرگیز کوردستان بەشێك نەبوە لە بەغدا یان عێراق، بەپێچەوانەوە گەلێ جار بەغدا لەژێر دەستی میرە کوردەکان بوو ئاخیرەکەی عەبدولڕەحمان بابان لە سلێمانی والی بۆ بەغدا دیاری دەکرد، کوا یەك نمونەمان نیە لە بەغدا عەرەبێك دیاری کرابێ بۆ والی ویلایەتی شارەزوور یاخود ویلایەتی دیاربەکر یان هەر ویلایەتێکی کوردستانی، ئینجا لەو دواییە کوردستان گەیشتە ئاستی ئیالەت.

**قەیرانی جیگۆڕکێی رەسەنەیاتی لە توخمە پیکهینەرەکانی عیراقی :**

بابلی وسۆمەری و ئاشوری وچەندین شارستانی تر لە عیراقی ئیستا رەسەنن ، بەلام ئەوانە ئاسەواریکی وایان نەماوە ناویان بنێین لەتوخمە پیکهینەرەکانی عیراق،ئەوەی هەیە ئیستا زیاتر شیعەو سونە وکورد توخمی بنچینەیی پیکهینەری عیراقین ، بەو پێوانەیە بیت بەراورد ناکرێ کە کوردستان رەسەن ترە لەعێراق بەتایبەتی لەڕووی سیاسی، ناوی کوردستانیش مەدلولی یاسایی و سیاسی و مێژوویی هەڵگرتوە کە گوزارش لە پەیوەندییەکی کۆنی یاسایی و سیاسی نێوان (1-هەرێم-نیشتمانی کوردان ،2-گەل- گەلی کورد و تورکمان و مەسیحی ، 3-دەسەڵاتی سیاسی-میرنشینەکان) دەکا، کە ئێستا مەرجیی بنچینەیی یاسای نێودەوڵەتیە بۆ دروستکردنی دەوڵەت، هەرچی عێراقە مەدلول ومانایەکی عروبی هەڵنەگرتوەو وشەکەش عەرەبی نیە، گوزارش لە پەیوەندی نێوان (عەرەب و نیشتمانی عەرەبی و دەسەڵاتی سیاسی) ناکا .

ئەو ناوچەیە لەمیژوودا کۆمەڵێك ناوی جوگرافی شارستانی هەڵگرتووە لەوانە، بلاد سومر(بروانە نەخشەی: هیکاتابۆس)، بلادکلد (بروانە نەخشەی هیرۆ دۆتس)، بلاد بابل و بلاد ئاشوور (بروانە: نەخشەکانی ئیرانتینیتس، هەروەها نەخشەی هیکاتاپۆسی)، میزۆبۆتامیا بروانە: (نەخشەکانی یۆنانی کۆن و نەخشەکانی تر لە کتێبی: تاریخ العالم ـ dtv ـ هیرتمان) هاتوە، بلاد مابین النهرین، وادی

الرافدین، السواد، بەشێکی لای ڕۆژئاواش بە (بادیةالشام) ناوزەدە بووە، لەخواروو ڕۆژ ئاواش بە (نەجد) ناودەبرا، لەخوارەوەش لەو دواییە پی دەوترا (منتفك) و جزیرە، بەشی سەرووش بە ئیقلیم جبال و بلاد الکورد و بلاد جزیرە و کوردستان ناوزەد دەکرا، هەموش لەچوار چێوەی زاراوەیەکی گشتگیرتر بە (هلال الخصیب) ناوزەد دەکرا. هەریەکە لەوانە سنورێك دەگریتەوە هیچیان لەگەل ئەو عیراقە سیاسیەی ئێستاجووت نابێت، بلاد السومر، بلاد الأکد، بلاد الأشور، بلاد الکلد، میزوبوتامیا، وادی الرافدین، السواد، المنتفك، بادیە الشام، الجزیرە، أقلیم الجبال، کوردستان، الهلال الخصیب، العراق العربی، العراق العجمی، بەو شێوەی خوارەوە:

1 ـ ناوی سۆمەر وئەکەدوئاشورلە هەر سێ نەخشەی(ئیرانتویتنس ـ 196) پ ز.[682] (هیکاتابوسی ـ 475 پ ز)، (هیرودوتس ـ 5،4قرن پ ز) [683].

2ـ هەریەکە لەوانەش لە نەخشەی (هیرۆدتس) هاتوە لەیەك کاتدا لە شوێنی جیاجیای عیراقی ئێستا، فۆرستەر دەلێ: کلد لە دەورو بەری بەسراو ئەو شوێنەی ئێستا شیعەی لێ نیشتەجێن و دوای ناونرا عیراقی عەرەبی[684].

3ـ هەر لە نێوانی(4 ـ 2)پ ز یۆنانی ورۆمانیەکان ناویان لە سەرووی بەغدا ناوە میزۆپۆتامیاو ئەو ناوە بۆ ئەو ناوچە بەکارهاتوە لە هەمو دونیا، بە خوار بەغداش ووتراوە میزوپۆتامیای خواروو[685].

4ـ بلاد مابین النهرین: زۆربەی وا تیگەیشتون کە ئەوە تەرجەمەی میزۆپۆتامیا، ڕاست نیە، یاقووت حەمەوی لە (معجم البلدان) ڕونی کردۆتەوە و دەلێ: بلادمابین النهرین تەرجەمەی(میان ڕۆزان)ی فارسیە[686]، هەرچی میزۆپۆتامیایە وا پێدەچی لە ناوی سوڕدراوی (جەزیرەو بۆتان) هاتبێ لەو کاتەی کە سوپاکەی زەینەفۆن بەو ناوچەیە ڕەت بوە.

---

[682] هەمان سەرچاوە "خریطة رقم (9).

[683]ـ بڕوانە: العراق في خوارط القديمة ـ جمع وحققها ـ الدكتور احمد سوسة، مطبوعات المجمع العلمى العراقى 1959ـ مطبعة معارف ـ بغداد " خريطة رقم (6)

[684]ـ هـ س ـ خارطة رقم ـ 3.

[685]ـ فورستر... المصدر السابق ج1 ص13.

[686]ـ ياقوت حموي ـ معجم بلدان... المصدر السابق ج2ـ ص272

5 ـ عیراقی عەرەبی وعیراقی عەجەمی بە پێی: لسان العرب، وقاموس المحيط و سیاحتنامە ونەخشەی ئیبن الحوقل و نەخشەکانی عوسمانی وزۆری تر عیراقی عەرەبی دەورو بەری بەسرای[687] گرتۆتەوە تا نزیك کوفە، لەوێ تا نزیك هند عیراقی عەجەمی پێ ووتراوە .

7ـ لەو شوێنانەی کەناوی عێراق بەگشتی هاتوە وفراوانترین سنوری پێ دراوە، بریتیە لە سنوری بەغداو بەسرە، لەکاتی دروستکردنی عیراق لەلایەن بەریتانیا و وەزارەتی هندی بەریتانی هەر لەزوەوە تێبینی جیایی ویلایەتەکانی موسل و بەغداو بەسرەی لە(یاسای عوسمانی) کردبوو[688]، دەلیلی عێراقیشیان هەر بەغداو بەسرەی گرتبۆوە.

8ـ بەو شێوەش ناوی تری وەك سەواد وبادیەونەجدومونتەفەك وجەزیرەو..زۆر ناوی تری هەڵگرتوە

ئەو ناوانەش بەزنجیرەی میژووی یەك لەدوای یەك نایەت، هەروەك بەشێك لە میژوو نووسە عەرەبەکان دەیانەوی بیسەلمێنن ئەو عیراقە سیاسیەی ئێستا ڕەسەنایەتی میژوویی و جوگرافی و شارستانی هەیە، لەهیچ سەردەمیك یەك (وحدە ئیداری یان سیاسی یان جوگرافی یان رەگەزی یان ئاینی.... هتد)نەبووە، تەنها لە سەردەمی ئیداری عەباسی ویلایەتی عیراق هەبوە لەسەڕوی بەسرە تا سامەرەو تکریت، بەدەگمەن لە کتێبی (العبر فی خبر من غبر) باس لە دەسەڵاتی (قائم بأمر الله )دەکا بەو شێوەی خوارەوە: وأما دست السلطنة بالعراق فكان لجلال الدَّولة: بغداد وواسط والبطائح وبعض السَّواد وليس له من ذلك أيضًا إلا الخطبة فأما الأموال والأعمال فمنقسمة بين الأعراب والأكراد والأتراك مع ضعف ارتفاع الخراج والوزارة خالية من كبس والوقت هرج ومرج والناس بلا رأس[689].

---

[687]ـ لەزۆربەی کتێبە کۆنەکان ولە خودی نەخشەی ئیبن حوقل عیراق وبەسرە بە جیا ناویان هاتوە ئەوە(تارخ جرجانی)یە یەکێ لەو نمونانەیە...أبو عمرو أحمد بن عمر بن أحمد المطرز البكرآباذي كان قد كتب الكثير وأنفق مالا عظيما في الحديث وسافر إلى سجستان وبست وهراة ونيسابور وأصبهان والعراق والبصرة وبغداد واليمن كتب عن أبي عبد الله النقوي باليمن بصنعاء وحمل لي عنه إجازة مات يوم الأحد النصف من جمادى الأولى من سنة إحدى وأربعمائة - تاريخ جرجان ص 101

[688] سياسة البريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ص201

[689] الإمام الذهبي -العبر فی خبر من غبر ـ الإمام الذهبي ج1 ص668

**قەیران لەناوی دەولەتی عیراق:** هەولیکی زۆر دراوە بۆ بەڕەسەن کردنی ناوی سیاسی عیراق ،بۆ ئەوەی جیکەوتی سیاسی لە میژووی دوورو نزیك بۆ دابتاشن ولەو پرسیارەی دووری خەنەوە کە بریتانیا دایهێنابێت، لە وەرگێڕاوی ماددەی (1)ی سایکس ـ بیکۆ لە دەقە ئینگلیزیەکەی بۆ عەرەبیەکەی بیٚ هیچ بناغەیەك ناوی عیراقیان هێناوەتە ناوی کە لە ئەسلەکەی نیە ،هەردوو دەق بە عربی وئینگلیزی بەراورد بکە لەخوارەوە[690]، لەتویژینەوەی (العراق و الحركه الكماليه—ص28) تیایدا هاتوە: عیراق سیٚ نوێنەری لە (مەبعوسان ـ پەرلەمانی عوسمانی کە لە 1877/3/19 دامەزراوە) هەبوە، لە مەبعوسانی دووەمیش (6) نوێنەری هەبوە، هەلبەتە ئەوە هەڵەیە، وادێنێتە پیش چاو کە عیراقێکی وەك ئێستا هەبوبیٚ، کەچی ئەو توێژەرە لەسەر بنچینەی واقیعی ئێستای عیراق ئەو حوکمەی داوەتە سەر میژو، کە ئەو کاتی نەبووە، واتە هەلساوە هەرسیٚ ویلایەتی نوێنەرەکانی(بەسرەو بەغداو موسلی ـ کە عیراقی ئێستای لیٚ پیك هاتووە) کردوویە بەمولکی عیراق، لەڕاستیدا نوێنەری عیراق و سوریاو ئوردەن... هەرنەبوە، چونکە ئەو وڵاتانە بونیان نەبوە، ئینجا سەرەرای ئەوەش نوێنەر لە عوسمانی بەپێی مادەی (71)ی دەستوری عوسمانی (مەشروتیە) هەر مەبعوسێك (پەرلەمان تاریك) نوێنەرایەتی تەنها ویلایەتەکەی نەدەکرد، بەڵکو نوێنەری هەمو میللەتی عوسمانی بوو[691].

---

[690] 1. That France and Great Britain are prepared to recognize and protect an independent Arab State or a under the suzerainty of an Arab ،Confederation of Arab States in the areas (A) and (B) marked on the annexed map shall have priority of right of enterprise and local loans. ، and in area (B) Great Britain،chief. That in area (A) France shall alone supply advisers or foreign functionaries at the ، and in area (B) Great Britain،That in area (A) France request of the Arab State or Confederation of Arab States.

المادة الأولى: إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض المحلية، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.

[691] هەندیك پییان وایە ئەوە لاسایی مادەیەکی دەستوری فرنسی سالی 1791ی کردۆتەوە کە لە(بابی سێیەم )هاتبوو .

ڕاپۆرتەکانی بەریتانیا سەبارەت بەناوچەی عیراقی ئێستا بەناوی میزۆپۆتۆمیا بوە، بەشی هەرە زۆری کراوەتە (عیراق)، راپۆرتەکانی بەریتانی کەبەناوی ( review of the civil admunstraion of mesopotam) دانەری کتیبی (احوال العراق فی المرحلة المشروطية الثانية) هەمو میزۆپۆتۆمیاکانی بەعیراق تەرجەمە کردووە، هەمو راپۆرتەکان و کۆنگرەکان بەناوی میزۆپۆتامیا بووە، کەچی لە تەرجەمەدا وشەی میزۆپۆتامیایان کردوە بە عیراق، هەر لەو ڕاپۆرتانە بەو عنوانە ئینگلیزیەی کردوویە بەکتێب، بەڵام (جعفر خياط) تەرجەمەی عەرەبی کردووە بەو عنوانە: (فصول من تاريخ العراق القريب)، هەروەها ناوبراولە پەراوێزی ل253ی کتێبی (رسائل مس بيل) دان بەوە دەنێ کە عیراقی لە جێی میزۆپۆتامیا داناوە، بەوەش نەوەستاون لەسەر نەخشەش میزۆپۆتۆمیاکانی وەرگێراوە بۆ عیراق، بۆنمونە ئەونەخشەیەی کەبابلیەکان پێش 4000 سال لەمەوبەر (واتە2300پ ز) دایان ناوە، تیایدا شوینی بابلی و ئاشوریان دیاریکردووە، د.احمد سوسە هەلساوە کردوویە بەعینوانی (اقدم خارطة للعالم توضع فی العراق)، هەروەها کتێبی (العراق فی التاريخ ص91)دەڵێت: حمورابی دەیویست عراق یەکبخا !!، بەهەمان شیوەش دەستکاری میزۆپۆتۆمیا کراوە لەڕێکەوتن و دیکۆمینتەکان، دیسان بەنموونە لەڕێکەوتنامەی سیڤەر هیچ ناوێکی عیراقی لەبەشە ئینگلیزەکەی نیە (کەچی سێ جار ناوی کوردستانی تیا هاتووە)، لەبەر نەبونی ناوی عیراق ئەو کاتی لەمادەی (94) بەناوی (میزۆپۆتۆمیا العربيه) هاتوە، لەتەرجەمەدا کردوویانە بەعیراق، هەر بەهەمان شێوەش لەبەر نەبونی ناوی عیراق و ئەو ولاتە دەستکردانە لەڕێکەوتنامەی سایکس بیکۆ 1916 پیتی A ،B ڕەنگەکانیان بۆ دابەشی ناوچەکە بەکار هینا، لە راپۆرتی ویلایەتی مەوسل باس لەوە دەکا کە لیژنەکە پرسیاری ئەوەی کردبوو ئەرێ ئێوە عیراقین یان تورکی؟ بەشیکی زۆر ووتبوویان ناوی عیراقمان هەر نەبیتسوە .

هەتا دروست بونی دەوڵەتی عیراقیش لە سالی 1921 هێشتا بەتەواوی ئەو نـاوەی نـەبووە، نـاوی عیراق لە ڕێکەوتنامەکانیش نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی 1923 بـۆ یەکـەم جـار دوو جـار نـاوی عیراق لە مادەی (3) هاتوە .

ڕاستیەکەی ئەوەیە عیراق هەبوە بەو قەبارەیەی خۆی (کە پیشوو دیاریمان کرد)بەلام میژووی سیاسی نیە،بەپی (هنری فورستر) ناوی عیراق لە سەدەی (7) سەری هەلدا[692]، لە گەرمەی کێشەی ویلایەتی موسلیش ناوی عیراقیان بۆ سەدەی (11) گیرایەوە، بەڵام هەندیکیان عیراق دەگیرنەوە بۆ سەدەی 12 ، گوایە بەناوی (اریقا) ناوزەدکراوە[693]، نەخشەی ابن حوقل جوانتر ئەو ناوچەیەی دیایکردوەکە لەسەروی بەسرە بوە، تانەخشەی 1893ی ئیداری عوسمانیش هەرلەو ناوچەیە دیاریکراوە، ڕەنگە ناوەکانی تر بە جۆریك لە جۆرەکان مێژوەیەکی سیاسی وشارِاستانیان هەبێ ، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانیش لەنێوان32ویلایەت ویلایەتێك نەبوە بەناوی عیراق.

زۆرکەم لێ کۆلینەوەکراوەبۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی بەرجەستە تابزانین ئەو پیشنیارە لەکام لا هات و ناوی ئەو دەولەتەی (کەبەریتانیا بریاری دروستکردنی دا) بووە عیراق و نەبووە میزۆپۆتۆمیا، دوای ئاماژەیەکی ڕوونمان دۆزیەوە لە ڕاپۆرتی (ویلایەتی موسل) دەڵێ: بەریتانیا ناوی عیراقی بۆ ئەو ناوچە نوێیە دانا، ئینگلیز زۆر بەمەبەست بوو ناوی ناوچەکە عربی بێت، هەر خۆی ڕۆژنامەیەکی بەناوی (العراق) و یەکێکیش بەناوی (العرب)[694] دامەزراند لەگەڵ داگیرکردنی بەغداو تیایدا هانی بڵاوکردنەوەی بیری عروبی دەدا[695].

**قەیرانی سنور:**

1- لەسەدەی (9) ئەوەی ئیستا پێی دەگۆترێت عیراق کەوتبوە نێو دابەشیەکی فارسی ، دابەشی 12کورو(ئوستان)کراوە بۆ وەرگرتنی باج بریتین لە (شاد فیرۆز، شاد هەرمز، شادقوباد، بازیجان خسرۆ، شاد سابور،شاد بهمن، چوار تاسوج، ئەردەشیر، زەوابی، باه قوبادسەروو، باهقوبادی خواروو،

---

692ـ بروانە: سیاحتنامە ـ اولیا چەلەبی، شەرەفنامە ـ شەرەفخانی بدلیسی، معجم البلدان ـ یاقوت حموی، الصحاح ـ الـرازی، ....
ـ نشاة الدولة العراقية ـ ج1 ص 13.

693ـ حظارة العراق ج1ص14

694ـ ئەورۆژنامەیە یەکەم ژمارەی لە4/7/1917 دەرچوو دروشمەکەی خاکی عەرەب بۆعەرەبە، ئـاین شـتێکەو سیاسـەتیش شتێکی ترە

695ـ لەکتێبی: العراق في دوري الإحتلال والإنتداب عبدالرزاق الحسنی ج1 ص 67 وا هاتوە: جاء في جريدة (العرب) عدد (14) مصادف 16/ /1918: ((الحكومة البريطانية ترمى دائماً الى تنشيط الروح الوطنية-القومية- والإستقلال في حدود نفوذها)).

باهقوبادی ناوەراست،باە قوبادی نزم)[696] .

2- خزومی وئیستاخاری وابوالفدا وابن الفاجی وابن روستة وفضل اللة : بغداد پایتەختی عیراقەو موسلیش پایتەختی جزیرەیە[697] .(أبو عبید) لە کۆنەوە بەیانی کردوە کە عیراق:(طولە وعرضە ثمانون فرسخا)[698]. (فۆرستر)یش: دەڵێت سنوری سەرووی عیراق دەگاتە هێلی 34، زۆر بە ڕوونی (کی لیسترنگ) لە (بلدان الخلافه الشرقیه ص116) دەلێت سنوری عیراق نەگەیشتۆتە نزیك موسل، موسل لەسەدە(10) هەموی کورد بوون، ابن حۆقلیش هەروا دەلێت وگەرەکانیشیان بە ناوی: لاری وهەزبانی وحەمیدی ..بوە. (کوتلوف) وا باسی سنوری سەرووی عیراق دەکا:( حوضی نهری دجلة والفرات من حوالی بغداد الی الجنوب من مدینة بغداد، اما شمال بغداد فهو منطقة کوردستان الجنوبیة)[699] .

3- نەخشەی ئیبن حۆقل997ز سنوری عیراقی عەرەبی لەهەر چوار لا دیاری کردوە لە سەرووی بەسرە ناگاتە کوفە[700]. لە نەخشەی قەزوینی لە رۆژهەلاتی دیجلەو نزیك بەغدا لە چوارگۆشەیەکی بچوك هاتوە[701].لە نەخشەی بەلخی ( 934 مردوە) بە ناوی (سواد العراق)هاتوە:هەندێ ناوچەی (بابل وکوفە وبەسرە و واسیت) دەگرێتەوە،[702]. نەخشەکانی خوارزمی (845ز) ،بنیامین بن حنا(1160-1173) ،ابو الحسنابن سعید(1274ز) ، ئەلبیرۆنی(1030ز)، ابو الفداو(1331ز)ابن سعید المغربی (1274) ،عیراق بریتیە لەو نەخشانە لە خوارووی بەغدا تا نزیك کەنداو،نێوان دجلەو فوراتیش لەسەرووی بەغدا بە جزیرە هەژمارە . لە نەخشەی مقدسی ومسعودی لە(ص36التنبیه) دەقەکەی واهاتوە:(ان العراق یشتمل علی البلادالمحصورة بین الزابین والکائنة فی ماوراءسامراء،ویمتدحتی الحدود"السن" و"التکریت"مع القسم من منطقة هولیوان

---

[696] هەریەکە لە ابن قدامە وابن خردادو مقدسی و وکی لیسترنگ لە ص107-108 لێی وەرگرتوون .

[697] ولایة الموصل ..ص69

[698] العراق فی اثار الفتن ... المصدر السابق ج1ص259

[699] کوتلوف -ثورة العشرین ..ص25

[700]خارطة رقم: 19 لأبن الحوقل-(العراق فی الخوارط القدیمة) .

[701] هس -خارطة رقم: 31 لقزوینی.

[702].خارطة رقم: 12لبلخی.

المقارب للجبل وذلك الجزءمن منطقة الهيت)[703] . له نەخشەی قەزوینی(سەدەی 13) زۆر بەووردی عیراق وبەغدا وا لێك جیاکرایتەوە[704].عیراق کەوتۆنە رۆژئاوای بەغدا. له هەردوو نەخشەی ئیداری بەشی ئاسیای عوسمانی 1893 و1896 عیراق له خوارووی بەغدایە . لەنەخشەی سایکس پیکۆی 1916تەنها بەغداوبەسرەی به میزۆپۆتامیای خواروو(عیراق) دیاری کرد.

7- له( معجم ما استعجم) **فراوانترین سنوری عێراقی دیاری کردوە بیئەوەی عربی وعەجەمیەکەی لیك جیا بکاتەوە دەلێ:** (العراق هو مابين هيت الى السند و الصين الى الرى خراسان الى الدليم والجبال واصبهان ) ، بەریتانیا له کێشەی ویلایەتی موسل پەیڕەوی ئەو مەعجەمەی کرد، سەرەڕای ئەوەش له دۆخە هەرە فراوانەکەی لەخوار (جبل حمرين) سنوری عیراقە(بەهەردوو عیراقی عربی وعەجەمی)، ئەوە لەگەل (تەقویمی عوسمانی سالی1700وادیتەوە که ئەوکاتیش هەرموسل سەر بەحکومەتی دیاربەکر وبەغداو بەسرەشی خستبوە سەر میزۆپۆتامیای خواروو،[705]،قەزوینیش له باسی دیاربەکر دەلێ موسل شارۆچکەیەکە سەر به دیاربەکرە[706]، یاقوت حموی(1178)م له معجم البلدان ص290 له زۆر شوێن باس لەو سنورە دەکا به بۆنەی جیاجیا، له باسی (حلوان و هەبوونی شاهەنجیر لێی) دەلێ: حەلوان دواسنورە له سەواد و عێراق کەمێك سەروی بەغدایە که به هەرێمی شاخ ناودەبرێن، هەمووشیان لەگەل بروسکەکەی چەرچل تێك دەکەنەوە کەسوپای بریتانی گەیشتە سەرووی بەغدا داوای لێکردن بوەستن و ووتی خوارووی جبل حەمرین به سەروەوە سنوری کوردستانە[707]. بەو شیوە دێینە سەر دوەم پیکهینەری عیراق که کوردستانە .

---

[703] ولاية الموصل..ص68

[704] بروانة:خارطة رقم:13 –العراق فى الخوارط القديمة.

[705] ابن خلكان – وفيات الأعيان ج3ص240، هقروةها العراق فى التاريخ ص548-549،مزةفقرالدين كوكبرى ص132-134

[706] القزوينى- اثار البلادواخبار العباد368

[707] الإسلام والعلمانية واثرهما فى النشأة الدولة العراقية ..ص218

سنوری کوردستان رون و ئاشکرایە لەکۆنەوە تا دەگاتە نەخشەی عوسمانی و ڕێکەوتنی سیڤەر لە خوارووی چیای حەمرین، نزیك بەغدا دەست پێدەکا بۆ ڕۆژهەڵاتی بەسرە[708]، لەسەرووش لەگەڵ سنوری ئەرمینیا و ڕۆژهەڵاتی فورات و ڕۆژهەڵاتیش لە تەبریزەوە بۆ هەمەدان و نزیك خوزستان[709].

هیچ بەڵگەیەك نیە ڕۆژێك لە ڕۆژان کوردستان بەشێك بوبێت لە عێراق ، چونکە عێراق بوونی نەبووە ، عێراق عینوانێکی لاوازیش بووە لە مێژوو بۆیە عیبارەتی (کوردستانی عێراق)یش هەرنەبوە، ئینجا وەسفی کوردستان بە (شمال العراق) هەر بە کفری جوگرافی وەسف کراوە، هەموو مێژوونووسە عەرەبەکان پاڵپشت دەکەنە سەر یەك بەلگەی زۆر سادە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە باشوری کوردستان سەر بە عێراقە، ئەویش ئەوەیە (شەریف بن حوسێن) لە ڕاپەڕینە خیانەتکاریەکەی ساڵی 1916 لەدژی خەلافەتی ئیسلامی (عوسمانی)بە فیتی بەریتانیا بەڵێنی پێدا بیکاتە سەرۆکی عەرەبی بەشی ئاسیا بەپێی (مراسلات شریف- ماکماهۆن 1915- 1916)، جا لەدیاریکردنی سنوری ئەو دەوڵەتە عەرەبیەی ئاسیا هەریەکە لە (حزبی فتاتی عەرەبی و جمعیەی عهد) لەدیمەشق لە 1920/3/8 نامەیەکیان بۆ شەریف حوسێن نووسی تیایدا داوایان لێکردبوو کە ئامێدی و موسڵیش بخەنە سەر ئەو دەوڵەتە، دەقی نامەکە لەلایەن شەریف مۆری لێدراو درا بە ماکماهۆن و ئەویش وەڵامی نەدایەوەو پێی وت سنورتان لەناوچەی بەغدایە، هەروەك دواییش لە سایکس-بیکۆ هەروا هات و سنوریان بەغدا بوو.

ئەگەر سەرنجێکی خێراش بە ڕێکەوتنە نێودەوڵەتیەکان بگێڕین چاکتر ئەو پرسانە روون دەبێتەوە هەرچەندە زۆربەی ئەو ڕێکەوتنانەش بە قازانجی کورد نەبووینەو لەدژی بووە:

---

[708] ) بڕوانە: نەخشەی عوسمانی ساڵی 1893، بڕوانە سیاحەتنامە، بڕوانە دەقی ڕێکەوتننامەی سیڤەر کە 433 ماددە پێکهاتووە ماددەی (62) باسی سنوری کوردستان دەکا.. لەگەڵ زۆر سەرچاوەی تر.

[709] ) ئیبن بەتوتە کە لە بەسرە بەرەو شیراز دەڕوا دەڵێ میوانی عەشایرە کوردەکان بووم و زۆر ڕێزیان لە زانای ئاییینی دەگرت.

1- له رێکەوتننامەی سایکس-بیکۆی 1916 سنورێك بەپێی مادەی (1) و (2) بۆ عێراقی پێشنیارکراو دانرا له بەسرا تا بەغدا ناوچەکانی رۆژهەلاتی عێراقی ئێستای نەدەگرتەوە[710].

2- له کۆنگرەی سان ریمۆ ویلایەتی موسڵ که ببوه بەشی فەرەنسی خرایەوه سەر بەشی بەریتانیا.

3- له هەموان رونتر له گۆنگرەی سیڤەری 1920 سنوری ئەو ولاتانه هاتبوو، چونکه ئەو کۆنگرە تایبەت بوو به دابەشکردنی مومتەلەکاتی عوسمانی، لەو کۆنگرەیه کوردستان به عنوانێکی سەربەخۆ له بەشی سێیەم لەماددەی 63 له عوسمانی جیاکرایەوه، کەچی عێراق (بەناوی میزۆپۆتامیای عەرەبی) له بەشی پێنجەم له ماددەی 94 لەگەڵ سوریا پێکەوه له عوسمانی جیاکرانەوه، ئیتر تا ئەوکاتیش کوردستان هیچ پەیوەندییەکی به عێراقەوه نەبووە.

بەو شیوەیە پیکهینەرە بنچینەییەکانی دەولەتی عیراق به تەرازووی نەتەوەیی بریتیە لەدوومیلەت(عەرەب وکورد) لەدووهەریمیش کوردستان وعیراق بوە ،وەك له یاسای دروشمی عیراقیش ئەو راستیە دەردەکەوێ که لە3/3/ 1933 به یاسای ژ:25دەرچوە ئەوەی حوارەوە دەقەکەیەتی :

**استناد**

**نحن ملك العراق**

**بموافقة مجلسي الاعيان والنواب امرنا بوضع القانون الاتي : –**

**المادة 1**

**يتالف شعار الدولة من رقعة ملونة بالوان العلم العراقي الاحمر من فوق فالاسود فالابيض فالاخضر تضمها حاشية مذهبة وفي طرفيها العلويين ضمتان يتكون منهما زهرتان مربوط كل منهما بشريط مذهب متشابك على شكل ذوابة . ويعلو الرقعة التاج العراقي مستندا الى كوكبين ذوي سبع شعب مزخرفة تحوي الوان العلم العراقي رمزا الى العنصرين العربي والكردي وفي وسط**

[710] برِوانة دةقى نةخشةى (سايكس-بيكؤ) و ماددةكانى (1) و (2)

الرقعة ترس ذو اطار مكتوب في قسمه الاعلى بالخط الكوفي (العدل اساس الملك) وفي قسمه الاسفل (1339) وهو التاريخ الهجري الذي تبوا فيه جلالة الملك فيصل الاول عرش العراق وعلى طرفي الاطار ما بين الكتابتين نقوش من الطراز العربي وفي وسطه اربع نخلات يرى خلفها في الافق جبال متصلة بالسماء الزرقاء الفاتحة اللون وابار نفط ويجري من فوق نهران يرمزان الى دجلة والفرات ويلتقيان في اسفل امام النخيل رمزا الى شط العرب ويتقاطع في ملتقى النهرين سيف ورمح – الاول من الجهة اليمنى والثاني من اليسرى . ويسند الترس جواد عربي من الجهة اليمنى واسد بابلي من الجهة اليسرى وفي اسفل الرقعة تحت الترس يتقاطع غصن قطن ورابطة قمح ذات سبع سنابل .

**المادة 2**

يسنّ نظام خاص لتعيين المناسبات التي يستعمل فيها شعار الدولة والاماكن الرسمية التي يعلق عليها .

**المادة 3**

يلحق بهذا القانون انموذج مصدّق من شعار الدولة .

**المادة 4**

على هيئة الوزارة تنفيذ هذا القانون .

كتب ببغداد في اليوم الثالث من شهر اذار سنة 1931 واليوم الثالث عشر من شهر شوال سنة 1349 .

فيصل

| عبد الله الدملوجي | رستم حيدر | نوري السعيد |
|---|---|---|
| وزير الخارجية | وزير المالية | رئيس الوزراء ووكيل وزير الداخلية |
| مزاحم الباجه جي | جميل الراوي | جمال بابان |
| وزير الاقتصاد والمواصلات | وزير الدفاع | وزير العدلية |

عبد الحسين
وزير المعارف

**قانون شعار الدولة العراقية رقم 25 لسنة 1931**

.

لەقەیرانەوە بۆقەیرانی تر- مەبەست لە دروست کردنی دەولەتی عیراقی لەلایەن بریتانیا:

فیکرەو جێبەجێ کردنی ئەو دەوڵەتۆکانەی وەك عێراق و ئەردەن و سوریا و کوێت و...هتد. رۆژئاوایی و زایۆنی پەتیە، پیلانێکیش بوو لەدژی عەرەب و کورد و تەواوی ئومەی ئیسلام، چەند مەبەستێکی شاراوە لە پشت ئەو هەنگاوەهەیە :

1- بۆ ئەوەی جارێکی تر خەلافەت زیندو نەبێتەوە.

2- ئومەتی ئیسلامی نەمێنێ و پارچەپارچە بێت و چەمکی نەتەوایەتی ئیقلیمچیایەتی جێی (دار الاسلام) بگرێتەوە.

3- واشیان دابەشکرد کە ئارامی و حەوانەوە نەبێ هەر کێشە بێت هەروەك دەبینین هەر کێشەیە.

4- لە هەمووی گرنگتر بۆ ئەوەی لەو دابەشیەداو لەنێو ئەو دەوڵەتۆکانە بە سانایی جێی ئیسرائیلی چاوەڕوان کراوبێتەوە..

لەگەڵ چەندین مەبەستی تر(کەلەبەشی سایکس پیکۆی ئەو مەوسوعە باس کراوە)، بەو شێوەیە ئەو مەلبەندەی کە بڕیاری دروستکردنی عێراقی لێدرا لە هەمان شوێن بڕیاری دروستکردنی ئیسرائیلی لێ دەرچوو سەرەتاکەی بەڵێنی بەلفۆڕی 1917 دەرچوو.

ئەگینا لەمێژوودا بەڵگەنامەیەکی سکالاّ یان داواکارییەك نابینی خەڵکی ئەو ناوچەیەی ئێستای پێ دەوترێ عێراق داوای کیانێکی سەربەخۆی عێراقیان کردبێ، هەتا شۆڕشی بیستیش داوای عێراقی نەبوو، بەڵکو شۆڕشێکی ئیسلامی بوو بە سەرۆکایەتی (أ.شیرازی) و باقی سەرکردەکان ئیسلامی بوون ، داوایان ئەوەبوو کافر لە (دار الاسلام) دەرچێ.

فیكرەو جێبەجێ كردنەكەی(دروست كردنی دەوڵەتی عیراقی) بەدەر بوو لە ئیرادەی میللەتانی كورد و عەرەب و توركمان و... بەڵكو بەریتانیا تەكلیف كرا بۆ جێبەجێ كردنی ئەو پلانە ترسناكەو ئەویش بە ئاگر و ئاسن جێبەجێی كرد، لەسەرەتادا عێراقی سیاسی دروستكرد و سنوری لە هەرچوارلا بۆ دیاریكرد هەر خۆی، دوای بە نوسراوی رەسمی دام و دەزگاكانی دەوڵەتی عێراقی بەو شێوەیەی خوارەوە دروستكرد:

1- حكومەت: یەكەمجار ئەنجومەنێك بەناوی (مجلس الدوله العراقیه) پێكهات لەوانە: (مس بیل، سیربونام كارتر، كۆلۆنیل هاول، میجر بولارد، مستر فیلبی)، دوایی (برسی كۆكس)ی حاكمی ئەو ناوچەیە بە نوسراوێكی فەرمی لە رۆژی 1920/10/25 (عبدالرحمن نقیب)ی تەكلیف كرد حكومەتێك دروست بكا هەر لە نامەكەدا ناوی وەزیرەكانیشی تێدابوو[711] ،ئەویش بووە یەكەم سەرۆك وەزیران ، ئەو حكومەتە وەزارەتی دەرەوەی نەبوو تا برسی كوكس بە نوسراوی فەرمی ژ:A،B-42) لە 8/ئایار 1923 ئەو وەزارەتەش دروستكرا.

2- سوپای عێراق: ئەو سوپایە لە 6/كانون دروست نەبوە، بەڵكو لەگەڵ هاتنی بەریتانیا و گەیشتنی بە بەغدا لە 1917/3/17 بناغەی دانرا لە (شەبانە و لیڤی و تەیاری- جاش)، دوای لە فەقەرەی (2)ی لائیحەی ئینتداب و لە بڕیاری ژمارە (3)ی كۆنگرەی قاهیرە بەریتانیا بڕیاری دا ئەو سوپایە دروست بكا، ئەوەش كرایە نوسراوێكی فەرمی لەلایەن برسی كۆكس بە (ژ:9314) لە 1921/5/26 بۆ ئەنجومەنی وەزیران تیایدا فەرمانیان لەسەر دەكا سوپا لەوانە دروست بكرێ[712].

3- مەلیك: ئەو دام و دەزگایانە دروست كرابوو بە حكومەت و سوپایە خائینەكەشەوە رووبەڕوی شۆڕشی بیست ببونەوە، ئینجا مەلیك بۆ عێراق دانرا، برسی كۆكس بە نامەیەكی فەرمی لە 1921/7/5 داوای لە بەریتانیا كرد مەلیك فەیسەڵ بكەنە شای عێراق بەهۆی ئەوەی خۆی و باوكی

---

[711] دەقی نامەكە لە (موسوعه العراق السیاسی) بخوێنەوە لە ص413.

[712] ) بڕوانە: الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة- فصل الثالث) كاتب.

(شەریف بن حسێن) لە خزمەت پرۆژەی بەریتانیا و ئاژانسەکانی زایۆن بوونە، بۆیە لە ماددەی (2)ی کۆنگرەی قاهیرە لە 1921/3/12 بەریتانیا بڕیاری دا مەلیك فەیسەڵ بکاتە شای عێراق لەسەر پێشنیاری برسی کۆکس، بۆ ئەوەی بە تەواوی ببێتە مەلیك (هەروەك سەرۆکەکانی تری وڵاتانی عەرەبی تازە دروستکراو) دەبوایە بچێ تەزکیە لە ئاژانسی زایۆنی بهێنێ، ئەوەبوو مەلیك فەیسەڵ لەگەڵ وایزمانی زایۆنی دانیشتن و لەسەر (12) مادده رێککەوتن و هەردوولا مۆریان کرد[سمتبی]، و دانی نا بە حکومەتی داهاتووی ئیسرائیل لە فەلەستین، لەرۆژی 1921/6/29 گەیشتە بەغدا.. هەموو ئەو هەنگاوانە لەسەر مەسروفی بەریتانیا بوو.

4- پەرلەمان: لە سایکس-بیکۆ و چەکی ئینتداب و لە مادەی (18)ی پەیماننامەی بەریتانی عێراقی ساڵی 1922 باسی دروستبونی پەرلەمانی عێراق کرابوو، تا لەرێی برسی کۆکس لە 1920/11/10 مۆڵەتی تایبەتی لە حکومەتی بەریتانیا بۆ حکومەتی عێراق هات و تیایدا فەرمان دەکا کە پەرلەمان دروست بکەن، ئەوەبوو لە 1924/3/27 دروستبوو.

5- دەستور: لەسەرەتادا لیژنەیەك بە فەرمانی مەندوبی بەریتانی لە بەغدا دروستکرا بۆ داڕشتنی دەستور بە سەرۆکایەتی (بۆنهام کارتەر) و هەریەکە لە ئەندامیەتی: میجەر یۆنگ، مستەر دروار، مستەر فیدرسۆن،... نوسخەکە بە ئینگلیزی نوسراو دوای لیژنەیەك پێکهاتبوو لە: ناجی سویدی، ساسون حسقیل، روستم حیدر) تەرجەمەی عەرەبییان کرد و لە رۆژی 1925/3/17 بەناوی (یاسای بنەڕەتی) بووە دەستوری عێراق.[14]

بەو شێوەیە دام و دەزگای دەوڵەتی عێراقی دروستبوو، هەر بەریتانیاش سنوری بۆ دیاری کرد، لە سەرەتادا بەنیاز بوون تەنها لە ویلایەتی بەسرە ئەو دەوڵەتە دروست بکەن دوایی لەگەڵ سەرکەوتن سنوریان فراوانکرد، تا گەیشتنە بەغداو دوایی موسڵیش، زۆر سیناریۆی تریش گەڵاڵەکرا لەلایەن مەڵبەندە جیاجیاکانی بەریتانی، بەڵام بەپێی هەردوو بەرژەوەندی باڵای ئیمپریالیزمی و ئاسایشی

---

[713] 13) دەقی رێکەوتننامەکە بە عەرەبی و ئینگلیزی لە کتێبی (الملك فیصل الاول- ص28 .

نەتەوەیی ئیسرائیلی چاوەڕوان کراو ئەو سنور و قەبارەیە بۆ عێراق هەڵبژێردرا، لەساڵی 1932 بەریتانیا عێراقی خستە نێو (عصبە الامم) وەك ئەندامی ژمارە (57) و بوو بە دەوڵەت.

قوول کردنەوەی قەیران: هەروەك چۆن لە دەستور هەندی مادەهەیە بە(صلب)وەسف کراوە ناکرێ دەستکاری بکەی ئاواش ئیستعمار دیزاینی سیاسی رۆژهەلاتی ناوەراست وسنوری عیراقی (وولاتانی تری دروست کراو) بە (صلب)پۆلین کرد، بەپێی بنەمای (عدم جواز المساس بالحدود الإستعمارية الموروثة) کەس بۆی نیە ئەو نەخشەودیزاینە تێك بدا هەروەك لە پرۆژەی (رۆژهەڵاتی ناوەڕاست)ی (شەمعون پێرس)یش وا هاتووە،دوای لە هەر 9 پرۆژەچاکسازیەکانی ئەمریکی وئەوروپی وعربی هەروا هاتەوە ، بۆیە هەقی قەومیە عەرەبیەکانی کۆن و ئیسلامیەکانی ئەو سەردەمە کە دەڵێن ئەو سنور و دەوڵەتانە دەستکردی ئیستعمارن ،لە بنەچەدا بۆ قەیران دروست بوە نەك بۆ چاکسازی ،کیشەکە ئەوەیە بواری دەستکاری وچاکسازیشیان نەهیشتۆتەوە هەردەستکاریەك ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەل رۆژئاواو ئیسرائیلیش،تەنانەت ئەو دۆخە بوویتە دابەشی جیهانی عربیش بەشێك پێیان وایە تا ئەو نەخشە سیاسیەی ئیستعمار تێکنەدرێ نەعرب یەکدەگرنەوەو نە گەشەش دەبیت و هەمو قەیرانەکان وەك خۆی دەبیت ،بەشیکیش ئەو سنورانەیان لا پیرۆز بوە ،لەو دواییە وای لیهاتوە وەك دووروویيەك کە دێنە سەر باسی عربی دەلین ئەو سنورانە دەستکردن ،کە دێنە سەر کیشەی کوردو هەندی پیکهاتەی تری (ناعرب)دەلێن نابی دەستکاری ئەو سنورانە بکرێ . بۆنمونە لە(البيان الأول لثورة 8 من آذار 1963 في سوريا ) واهاتوة : ((وكانت سوريا العربية وشعبها لا يعترفون بحدود قطرهم وانە يعيشون دائماً وأبداً في حدود الوطن العربي الكبير))[714]، کەچی تیۆری (تقسيم المقسم و تجزأة المجزأ)بەکاردێت ،فتوا دەرچوە بۆ پارچە نەکردنی ئەو وولاتانە، ئاواش دژی گەلالەکانی برناردلويس و بريجنسكی)بوون .

بەو شێوەیەو بۆ ئەو مەبەستە قەیراناویە عیراق و وولاتانی تر دروست کراوە ،ڕەسەنایەتی نیە ،ناتوانی وەلامی پرسیارە بنچینەییەکانی دەولەت بوون بداتەوە ،لەو پرسیارانە :کوا رۆژی نیشتمانی عیراقی؟ کێ بوو عێراقی دروستکرد؟ عێراق بە ئیرادەو جهودی میللەتانی ناوچەکە دروست بوو

---

[714] الموسوعة السياسية– النسخة الأصلية– نص البيان– ص 701 ملحق

یاخود بەپێی پیلانی ئیمپریالیزمی؟ ئەگەر جۆرج واشنتۆن دامەزرێنەری ئەمریکا بێت، محەمەد عەلی جەناح دامەزرێنەری پاکستان بێت، ئەتاتورك دامەزرێنەری تورکیا بێ... ئەی کێ دامەزرێنەری عێراقە؟ ..بەشێك بە شەرمەوە دەڵێن مەلیك فەیسەڵ! بەڵام راستیەکەی(مس بیل) و (برسی کۆکس)ە.. لە هەموو وڵاتێك رۆژ و جەژنی نیشتمانی هەیە کە گوزارش لە رزگاری دەکا، کوا ئەو جەژنە لەعێراق؟ هەموو ئەوانە بەڵگە نەویستن کە دەوڵەتی عێراق و خودی عێراقیش دروست کراوە.

لەوەتەی عێراقیش دروستکراوە پێکهاتەکانی عێراقی رێك نەکەوتوون ولە قەیران دایە، جاران لە (دار الاسلام)دا برا بوون نەك لە عێراق، بەڵام لەدوای دروستکردنی عێراق ئەو برایەتیە نەماوە، لە هەموو روداوێك لێك جیان، کاتێ بەریتانیا هات لە 1914 ئەوا شیعە و کورد بەرگرییان کرد، کەچی سوننە (مەبەست هەمووی نیە) بە گوڵ پێشوازی هێزەکانی بەریتانی کرد، لە 1919 و 1920 کورد و شیعە دیسان شۆڕشیان کرد دژی بەریتانیا، سوننەی عەرەب یان جوانتر ئەوەیە بڵێین عەلمانیە ناسیۆنالیزمەکان هاریکاری بەریتانیایان کرد، لە سەر بنچینەی(سزا وپاداش)ئەوعیراقە تەسلیمی کەمایە تیەکی سەر بە ئیمپریالیزم کرا، ئاوابوون تا شۆڕشی ئێران لە 1979 سەرکەوت و سەرو و خواروو دڵخۆش بوون، ناوەڕاست لەجیاتی رۆژئاواو ئیسرائیل جەنگی هەشت ساڵەی لەگەڵ کرد، دوای سەروو و خواروو پێویستی بەهێڵی ئەمانی 36، 34 بوو، کەچی ناوەڕاست پێویستی نەبوو، لە داگیرکردنی عیراقی 2003ز لەلایەن ئەمریکا ئەو جارە دیمەنەکان پیچەوانە بوونەوە ،سونە بەرگری کرد وکوردو شیعە خۆشحال بوون ،.. بەو شێوەیە تا ئەم ساتەش پێکهاتەکانی عێراق لەسەر (سەوابتی عێراقی) رێك نین تا ئەو رادەیە وەك بەرلین دیوار لەنێوان شیعەو سوننە لە بەغدا کرا.. ئیتر چۆن دەتوانین بڵێین ئوممەی عێراقی.. نە ئوممەیە و نە عێراقیش جێی شانازیە، کورد لە زەرەر زیاتر چ سودی لەعێراق نەبینیوە، عەرەبیش لە کورد.. بەو شێوەیە نەك دەوڵەتی عێراق بەڵکو خودی عێراق هەڵەیە ئینجا قەیرانیشە .

<u>**قەیرانی ئیستای عیراق**</u>: لەدوای 95 سال لە دروست بوونی دەولەتی عیراقی ،لەدوای ئەو هەمو خوین ڕشتنە ،لە دوای ئەو هەمو سامانەی لە پیناوی چارەی قەیرانی عیراق .. ئیستا دۆخی دەولەت وپیکهاتەکانی لە ڕووەکۆمەلایەتی و شارستانی ومەدەنی وزانستی و .. بەو شیوەیە:میلەتیکی

پەرتەوازە ،ئابووری ویران ،سیستەمی دەسەلات گەندەل ،دیکتاتۆری وخوێن ڕشتنی بەردەوام ،..پڕ بەمانا دەولەتیکی شکست خواردوە (دولە الفاشلە) ...بەهەمو ئەو قەیرانە هەمەلایەنەی ئەسل ودروست بوون وبەردەوامی دەووترێ قەیرانی عێراق .

(23)

**ئایدیۆلۆجی داگیرکاری** عقیده المحتل The ideology of the occupier

ئەو بابەتانەش دەگریتەوە (بەرگری نیشتمانی، ایدیۆلۆجیه الالمانیه ،رۆژهەلاتناسی ، سیکەوگورگە ،نمرمن الورق، ریکخراوی لوینزه، وەعازولسەلاتین، گۆردیما، نظریة فوضی الخلاق، دونیه - inferiority.. ئەیتیما(atima) (ارض لاصاحب لها- res nnullius)) دەگرێتەوە ،ماستاوچی،..)

مەبەست لەئایدیۆلۆجیای داگیرکەردامەزراندنی بناغەیەکی فکریە بۆئەوەی میلەتی ژێردەستە دووچاری پەرتەوازەیی ولێکترازان و نەفامی بن ،ئەو چەمکە ئاویتەیەو پیکهاتوە لەدوو وشەی لیکدراو ،ئایدیۆلۆجیاو داگیرکەر ،داگیرکەر زاراوەیەکی کۆنەو زۆر ئاست وجۆری هەیە، بەلام لەدوای سەرهەلدانی دەولەتی هاوچەرخ پیناسەکەی لە چوارچیوەی یاسای دەولی ڕوون تربۆوە لە پرسی مافی چارەنوس،بە پیوانەیەکی مادەی(1)ی کۆنگرەی مونتیڤیدیۆی1933 کە هەریەکە لە هەرێم(نیشتمان) وگەل(نەتەوە)و دەسەلاَت بوونە سێ کۆلەگەی یاسایی بۆدروست بوونی دەولەت وبنەمای مافی چارەنوس ، ئیتر هیچ گەلێك حوکمی گەلێکی تر ناکا ئەگینا بە داگیرکەر دەژمیرریت ،لەڕووی سیاسی و ئاینی وئەخلاقیەکەش لیك نزیکن هەر لایەك بیەوێ بەهیز ئازادی چارەنوسی لیزەوت بکا داگیرکەرە، بەلام دەکرێ هاریکاری هەبیت بۆ ئەوانەی نازانن ئەو ئازادیە بەکاربهینن یان دیاری بکەن .

ئەوەش ووردەکاری دەوێ ئەگینا بە سانایی وەردەچەرخێ بۆ داگیرکاریەکە بە خشکەیی ،زۆربەی قەبارەی ئایدیۆلۆجیای ئیستعماری رۆژئاوا لیرەوە بنیات نراوە لەڕێی یارمەتی ونەزانی بەرامبەر ئەو سیستەمە هاتە کایەوە ، لەنمونەی رۆژهەلاتیش بلاوکردنەوەی شیوعیەت هەندی جار هەمان رۆلی دەبینی ،نمونەی هەلۆیستەکانی حزبی شیوعی تونسی لە سالی 1919وەك درێژکراوەی حزبی شیوعی فرنسی دروست کرا، فرنسا وئیتالیاش داگیرکەری ئەو ناوچانە بوون بۆیە حزبی شیوعی تونسی نەیتوانی ئەو دوو دۆخە بە سەلامەتی کۆ بکاتەوە لە ئەنجاما کەوتە بەرەی فرنسی لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی تونسی ، گەلێ جار عەلمانی کوردیش هەلمەتێکی توند دەکاتە سەر ئاینی

ئیسلام ودەلیٚ ئەو ئاینە بوویتە زەمینەیەکی سانا بۆ بەدەولەت نەبوونی کوردستان وئامرازێك بەدەست داگیرکەرانی عربی لە مێژوو ولە ئیستادا ، بەشێکە لە ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر ،ئەوەی ئەو بۆچوونە بەهێز دەکا بەکارهێنانی ئاینە لەلایەن داگیرکاری وبەکار نەهێنانیەتی لەلایەن ئیسلامی کورد .

هەرچی ئایدیۆلۆجیایە بە مانای زانستی فکروهزر ،فەیلەسوفی فرنسی (دیسترات) بەکاری هیناو کارل مارکسیش لە کتیبی(ایدیۆلۆجیە الالمانیە) پەرەی پیداو بوە زاراوەیەکی جیهانی (زیاتر لەبارەی ئەو چەمکە لەو مەوسوعەیە دریژەی هەیە )،هەمو لایەك بەکاری دەهینن ،تایبەت نیە بەچینیك ،داگیرکەرانیش بەکاری دەهینن .

بەو شێوەیە گەلی جار وادیتە بەرچاو داگیرکەران هەر بە پرۆسەیەکی سەربازی پەتی هەلسابن،ئەو جۆرە داگیرکاریە عادەتەن مەودای کورت بوە ،ئەوانەی ئایدیۆلۆجی وپاساوی خزمەت وئامانجداریان بەکارهیناوە سەرکەوتوتربووینە،بۆ ئەو مەبەستە زەمینەو پاساوی ئاینی و مرۆیی و یاسایی وسیاسی و فەرهەنگیو تەعلیمی و بەکاردەهینی ،بەهەمو ئەو زیادەیەی لەپرۆسەیەی سەربازی دەووترێ ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر .

کەمتر ئەو چەمکە لە ئەنسیکلۆبیدیەکان (وەك چەمکیکی سەربەخۆ) تۆمارکراوە ،هەر ئەوەش بەشیکە لە ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر ، زۆربەی جار فەرهەنگی ئەو زال بوە هەروەك ئیبن خەلدوون دەلیٚ:( داب و نەریت و دەستووری سیاسی و فەرهەنگی و کەلتووری لای سەرکەوتوو زال دەبی بەسەر ژیرکەوتو)[715]، لەسەر ئەو بنچینەیە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لەگەل سەرکەوتنی سەربازی وتکنۆلۆجی رۆژئاواسەرخانەکانی فەرهەنگی وسیاسی ویاسای و بەرەبەرە زال بوو ،بەرواری زایینی جیٚی بە بەرواری (رۆمی) و (کۆچی) لەق کرد تا بوە جیهانی، ئینجا پیٚوانەکانی کیٚشان و پیٚوان و دووری و... هەمووی بووە مەتر و کیلۆ و لیتر و... ئینجا جل و بەرگیش لەگەلٚ زۆر دیاردەی تری وەك یاسای نیٚودەولٚەتی، جارنامەکانی...، ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر بە میکانیزمی جیاجیا بەرجەستە دەبیت ، بوارەکانی فکرو فلسفەومنهجی تەعلیم و ڕاگەیاندن وفیلم و..بەکاردیت .

---

[715] ابن الخلدون –مقدمة ، تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر-القاهرة ص192

**فەرهەنگ وئایدیۆلۆجیای داگیرکەر**:نیشانەی بنچینەیی سلوکی داگیرکەران تەفسیری ئەو ئایەتەیە: (قالت ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها وجعلوا اعزة اهلها اذلة وكذلك يفعلون )، لە کۆنەوە ڕێگەو ئامرازی جیا بەکارهاتوە بۆ ریخۆشکردنی داگیرکەر یاخود ووردتر بلێین مانەوەی داگیرکەر ، هیچ ریبازو ئاین ومەدرەسەیەك نەتوانراوە بپاریزرێ لەو ئایدیۆلۆجیەو هەموی بەکارهاتوە ،تەنانەت ئەو مەدرەسەو ئاین وریبازانەی کە پەیامی دادگەریشیان هەلگرتوە داگیرکەر توانیویەتی سوری پیبداو بەکاری بهینێ ، تەنانەت لە چرِی ئەو ئایدیۆلۆجیایە گەلێ جار فەرهەنگ وتیروانینی تایبەتی خۆشیان دروست بوە ، جاری تریش وایە هەمان زاراوەی باو دەستکاری دەکەن و مانایەکی بە پێی تەرازوەکانی خۆیان پێدەدەن ،با هەندێ نمونە لەزاراوە تایبەتیەکان بهینینەوە: زاراوەی ئەیتیما(atima) بەو میلەتانە ووتراوە کە مقەوەماتی مانەوەیان لاوازەبە هۆی باری کۆمەلایەتی وسیاسیو شارستانی وفەرهەنگی[716]، زاراوەیەکی تر (دونیە -inferiority ) بەو تەقەلایە ووتراوە کە ئیستعماردەیدا بۆ موستەعمەرە تا وای تیبگەیەنی ئەو لاوازەو ناتوانی گەشە بەخۆی بداو دەولەتی پی دروست نابیت ،مقەوەماتی گەشەی نیە[717] زاراوەی (sub-man - الإنسان الناقص) لەو قاموسە جێی دەبیتەوە ،.. زاراوەی (ارض لاصاحب لها- res nnullius)بەو ناوچانە دەووترا ئیستعماری دەچوێ بیخاوەن بوو بەلکو کەوتنە ژێر سیستەمی ئینتداب*،(بنەمای ملتۆن) ((لا تدع بريطانيا تنسى رسالتها في تعليم الأمم كيف تعيش))،[718] ، کة لە پەرەگرافی (4) ودیباجەی ماددەی (22)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە یاسایی کراو وەسفیان دەکات و دەڵێت: میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەولەت، بە هەمان شێوەش چەکی ئینتدابەکان بە ناوی بەرەو ئۆتۆنۆمی هاتبوون ڕاستەوخۆ وەك مادەی (3) ئینتدابی بەریتانی بەسەر

---

[716] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص19.

[717] الموسوعه الميسره للمصگلحات السياسيه ص210

* لە ڕاستیدا سیستەمی ئینتداب جیا بوو لە بنەماکانی مافی چارەنوس کە لە جامعەی ئیسلامی و دوای لە 14 بنامایەکەی ویلسون ولە جارنامە هاوبەشەکەی فرنسی وبریتانی هاتبوو، بەلکو ئینتداب جۆرێکی تر بوو لە دابەشی ئیستعماری، ئەوەش هۆیەکی تر بوو کە کۆنگریسی ئەمریکی قایل نەبوو ئەرمینیا وەرگرێ وەك ئینتداب.

[718] لمحات... المصدر السابق ج5- ص56

فلستین[719] یان ناڕاستەوخۆ لەوانی تر، بەڵام ئەو وڵاتانە ئەوانەن کە لەژێر دەستی وڵاتێکی هاوپەیمانی دیاریکراو بوون، لەوەش دابەشیەکی تر هەبوو بەپێی فەرهەنگی داگیرکەر، سێ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو بۆسیستەمی ئینتداب، وولاتانی ژیر دەستەی عوسمانی میلەتانی عربی (A) بوو ، بۆ میلەتانی ئەفریقا کە دواکەوتوو تر بوو چەمکی ئەیتیما وخاکی بیخاوەنی دەگرتەوە پۆل(C )دیاری کرا بوو .

جاریش وایە خوایی وبەختی بەکاردەهینا دەیان ووت ئیوە بۆ خزمەت وشوانی وجوتیاری دروست بووینە ،بۆ ژێر دەستەیی ، ئەوە رەگی بۆ رایەکانی (معدنی هەندی مرۆڤ تەنەکەو ...لە خواروو زیاتر باسی دەکەین) ، زاراوەیەکی تر( international caltivation analisis- تحلیل انماوالدولی ) بە مانای تەقەلای ئیستعماری سەقافی بۆزال بوون بەسەر فەرهەنگی تر و داگیرکراو ،کۆتا زاراوە (نظرية فوضى الخلاقة)یە کە بەشێك پێیان وایە داگیرکەرانی ئیستای جیهانی ودەڤەری بەکاری دەهێنن بۆ وولاتانی داگیرکراو یان وولاتانی بێ سیادە-جاریش وایە (ادارە بالازمات)یشی پێدەووترێت،...بەو شیوەیە زۆر زاراوەی تری داگیرکەر چ ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ لە پرۆسەی فەرهەنگی ئەو مانایە دەدات وەك زاراوەكانی (دول النامية-عالم الثالث- ئیسلامی سیاسی-...).

ئەو تەقەلایەی ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر هەربە داهینان وداتاشینی چەمك وزاراوە نەوەستاوە گەلی جار هەولی ئەوەی داوە ناوو ومیژووش دەستکاری بکا ، جاریش وایە لە هەمان زاراوەدا دوو واتای جیای هەیە لە نێوان داگیرکەر و زل هێز و دنیا خۆران لە لایەك و، لە لایەکی تر لە لایەن میللەتانی ژێر دەستە و ڕزگاری خوازانەوە، هەندیکی لیهەلدەبژێرین بەخشتە :

| لە قاموسی میللەتان | لەقاموسی داگیرکەران |
| --- | --- |
| خەبات | تخريب |
| شۆڕش | عصيان |
| چالاکی | تیرۆر |

---

[719] بڕوانە دەقی چەکی ئینتدابی فەلەستین کە لە24/یۆلیۆ/1922دەرچوو، 28 مادە بوو.

| | |
|---|---|
| وەلاء | خیانەت |
| حزبایەتی | عـەمالة |
| خیانەت و جاشایەتی | خدمة الوطن |
| نیشتیمانی | خارج القانون |
| پابەندی | تمرد |

لەلای ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر بە کوردستانی باشور دەووترا (شمال العراق) ، لەلای تورکیا بە(خوارووی رۆژهەلاتی تورکیا)،لەلای ئیران بە ئازەربیجان وبەکوردستانیش ناودەبرا،بە زیمبابۆی دەووترا (شمال رودیسیا) ، تایوان بەچینی وفەرمۆزا بە پورتگالی ، کۆشۆڤا بە ئەلبانی وکۆسۆڤۆ بە سربی ، ئەنگۆلا لای پورتغال (افریقا الغربیه البرتغالیه) ئەندۆنیسیا (جزر الشرقیه الهولندیه)،[720] لەلایەن ئیسپانیاوە دورگەی ئیخلیایە، لە لای مەغریب لەیلایە، لەلای بریتانیەکان (کیبك)ە لەلای فرنسیەکان (فرنسای نوێیە)، لەلای تورك قوبرسە لەلای یونانی کبریاکە ،ناوی ئەندۆنیسیا (دورگەکانی هۆلەندی رۆژهەلات)بوە ، ناوی ئەنگۆلا (ئەفریقای رۆژاوای پورتەگالی)بوە، لای ئیسرائیل بە (زیفەی غربی) ووتراوە یهودا وسامرا ، تەنانەت دورگەی فۆکلەند 3 ناوی جیای هەیەو ..، لەکاتیکا لای میلەتان تاکە ئامرازی رزگاری شۆرش بوە کەچی لای ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر شۆڕش بەمانای ناعقلانی وبیهۆکارو نالۆژیکی وەسف کراوە ، لەهەموان توند تر ئیبن بادیس هاتۆتە دەنگ دژ بە داگیرکەری فرنساو لەسالی 1939ووتویەتی ئەگەر فرنسا بشلێ (لاالە الا اللە) من واناليم (لاالە الا اللە)ی من جیایە لەگەل ئەوەی فرنسی[721].

ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر رِۆ چوویتە مەیدانی تری ترسناك، ئاین چارەی جیـاوازی مرۆڤـەکانی کـردوە ورِەش وسپی و سەروو وخوارو یەکسـانن (النـاس سواسـیة کأسـنان المشـط) ،کەچـی ئایـدیۆلۆجیای داگیرکەر دەلیَ یەکسان نین ئەرستۆ کە دەلێ (الناس لیسوا متساوون کأسنان المشط)،تەنانـەت دەلـین توخمی بەشیك لەبەشەریت لەزیرِە بەشیکیش لە تەنەکەیە، پلەیان جیاوازە وەك رِۆمـی کۆنـو براهمـا وشادرای هندین وموالی سەردەمی ئەمەوی و ..، بەشێك لە فەیلەسوفەکان(هەندیکیا ئاینیشن:موسا

---

[720] بروانە بەشی یەکەمی (مەوسوعەی جودی) .

[721] ابن بادیس وعروبه الجزائر ص63

بن مەیمون یەهودی-فارابی —ابن سینا-) دوایش هەریەکەلە (شامپرلین)، (بەواس)، (فیشەر).. .وای بۆچووبوون کە توانای ئەقڵی نەتەوەیەك لەگەڵ نەتەوەیەکی تر جیایە، ئەرسەر دی گۆپینۆ1816-1882 لەکتێبێکی بە ناوی (مقال عن عدم المساواۃ بین الاجناس البشریە )دەلیت توانای بیرکردنەوەی هەموومیللەتیك وەك یەك نیە بۆیە تەنها میللەتی ئاری شایستەی ئەو سەرکردایەتیە، مەولەتیکی گەردوونی بەداگیرکاری دەدات ، لەکۆنەوە ئەوروپا لە بوارەکانی (فکر) و (خۆبەزلزانی) (سەرشارستانی) و (خۆ بە پێشەوا زانین)* زاراوەی (sub-man) واتە(مادون الإنسان)لێرە سەرهەلدەدا، .یەهوودی وعەرەبی شۆڤینیش تا ڕاددەیەك ئەو پاگندەیە دەکەن ،بزوتنەوەی زایۆنیش بە پێی پرۆتۆکۆلی (5) دەلێن خوا زیرەکیەکی تایبەتی بە ئیمەی یەهودی بەخشیوەو بەخەلکی تری (ئومەمی —جویم-اغیار) نەبەخشیوە، لە پرۆتۆکۆلی (10) دەلیٚ:( أنه لا مساواة في الطبيعة، وأن الطبيعة قد خلقت أنماطاً غير متساوية في العقل والشخصية والأخلاق والطاقة)**.ئەرستۆ لەکتیبی(رساله السیاسه-بۆلیتیك)دەلیت لە بنەچەدا خوا بەشەرەکانی وەك دەمی شانە دروست نەکردوە،هەندێکی بۆ خزمەتکاری وهەندێکیش خزمەت کراو،ئەوانەی تەنها دەزانن هێزی جەستەو ماسولکەیان بەکاربهینن ئەوا بەندەو خزمەتکارن، ئەوانەی عەقلیش بەکار دەهینن ئەوە ڕابەرو خاوەنەکانن،پەیوەندی بەندەو خاوەن وەك پەیوەندی عەقل وجەستەیە***، بۆیە دەبوایە ڕۆژانە 3 جار لە بەندەی عبد بدریت تابەردەوام ئەرکی خۆی بەبیربیتەوە کەئەو مرۆڤی تەواو نیە ، هەندێك لە عەرەبە شۆڤینیستەکانیش جار وایە هەمان بانگێشە دەکەن ودەلێن ئێمە لە ئاین زیاتر لە عەجەم تێدەگەین بۆیە ئێمە دەبیٚ دەسەڵاتدار بین و خەلکی تریش لە خزمەت ئێمە دابیٚ زاراوەی موالی وشعوبی لیٚ هاتە کایەوە ، ئەو جۆرە تێڕوانینە بوویتە تۆخمیکی بنچینەیی دروست بوونی ئەو

---

*هەر لەو چوارچێوەدا هەولی داوە مێژووی زانیاری بۆ خۆی پاوەن بکا، بۆیە ناوی لە زانایانی کۆنی خۆی ناوە باوکی زانست وەك:هیرۆدتس- باوکی مێژوو، ئەبیکرات- باوکی پزیشکی، سیۆکریتشس —باوکی هونەر،هیرکلیتس- باوکی دیالکتیك، ستراپۆ- باوکی جوگرافیا، بیتلیمۆس —باوکی گەردووناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش —باوکی کۆمەلێك لقی زانستی تریان پیٚ بەخشراوە...کەچی لەپێش ئەوانە باس لەو بابەتانە کراوە،هەمووی ئەوباوکە نینە.

[722]بروتوکولات حکماءالصهیون- ت:عباس محمود العقاد ط5 1980 بروتوکول رقم:1 .

[723] ج لویس- مدخل الی الفلسفة ص64

فەرمودەیەو تەفسیرەکەی : «يغسل من بول الجارية، ويرش من بول الغلام» [724].فإن العلماء حاولوا التماس حكمة في سبب التفريق بين بول الجارية وبول الغلام من حيث التطهير، من ذلك ما ذكره أبو اليمان المصري رحمه الله حيث قال: سألت الشافعي عن هذا الحديث، فقال: لأن بول الغلام من الماء والطين وبول الجارية من اللحم والدم، ثم قال: لي: فهمت؟ قلت: لا، فقال: إن الله تعالى لما خلق آدم خلقت حواء من ضلعه القصير، فصار بول الغلام من الماء والطين، وصار بول الجارية من اللحم والدم، قال لي: فهمت؟ قلت: نعم، قال: نفعك الله به [725].

ئەوانە هەموی بوویتە هۆی پتەو کردنی مەولەتیکی خوای بۆ داگیرکاری ، ئینجا بۆمانەوەشیان جۆرە ئایدیۆلۆجیەکی تریان دارِشتوە ، لەهەولدابوە دیاری کردنی نەخۆشی وکیشەکە بەدروستی نەدا، لە بەرامبەردا چارەسەری ناراستیش دەدا،بەلای چاکسازی ئابوری وتەعلیمی وفلسفەی ئیستعمار(تعمیر) ویازار دەروا.بەلای کیشە کەسێتی و هەندی مافی مەدەنی و مۆدیرنی دەڕوا ،بەلای کرۆکی کیشەکان ناچیت کە پرۆسەی داگیرکاری سەرچاوەی کیشەکانیەتی ، لە ئەزمونەکانی ئیستعمارکردنی ئەفریقاوئاسیاو ڕووبەڕووبونەوەی شۆڕشەکان وابوە ، لەو دواییەش لە کیشەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست بەلای ئەوە نایەت کە دابەشی ئیستعماری سایکسپیکۆ سەرچاوەی کیشەیە ئەو دێت لە (پرۆژەکانی ئیسلاحی رۆژهەلاتی ناوەراست) بەلای تەعلیم ودیموکراسیی وبازاڕی ئازاد دەچێت ،هەر لەو سۆنگەوە شیوازی چارەسەری ئەمنیە لەگەل شۆرش وراپەڕینەکانی دژ بەداگیرکردن ، هەتا دانوستانیشی دیالۆگ وئاشتی کەبەشیك بیت لەجەنگ وسەرکەوتن [726] ، هەندێ لە رەوشەنبیر و

---

(724) أخرجه: أحمد (المسند) 1/76 ، 97 ، 137، وأبو داود رقم 387 ، 389، والنسائي برقم (304)، والترمذي برقم (610) وحسنه، وابن ماجة رقم (528)، 531 – 533، وغيرهم.

وصححه الحافظ في (التلخيص) 1/28، ونقل عن البخاري والدارقطني تصحيحه، وكذا صححه: أحمد شاكر في تعليقه على (المسند) رقم (563)، والألباني في (الإرواء) رقم 166.

[725] سنن ابن ماجة ج1ص262 - .أخرجه ابن القطان في زوائده على ابن ماجة رقم 37.

[726] بەپێی چەندین سەرچاوە لەوانە (موسوعة العربية الميسرة- ماده: ديالوك) دیالۆگ وشەیەکی عەجەمیە بە بەستەی دووقۆلی وتراوە، لەناو کوردیش هەبووە، لە (رسوماتنامەی ملا محمودی بایەزیدی ) ناوی دیالۆك(دیلۆگی)لە شایی وگۆرانی هاتوە ، مۆنەلۆلۆج لە ئەسلدا بەمانای بەستەی یەك قۆلی ،منۆ لەبنەچەدا کوردیە ، هەرچی دوولۆگ واتە دووقۆلی ،جاروایە دوو کراوەتە دیا-دیا بەلاتینی مانای دوانەیی ،دیالۆگ لەوە هاتوە ...زیاتر لەبارەی مۆنۆلۆگ بڕوانە (موسوعة المصطلح النقدي – ت:عبدالواحد لؤلؤة ج1ص33).

نووسـەر و سیاسـەتمەدارانی جیهـانی سـێیەم و موسـڵمانان و وڵاتـە داگیرکراوەکـانیش جـار وایـە بەشانازیەوە بەدوای ئەو جۆرە دیالۆگانە کەوتوون، بەرەی دووەم لـە (بێهێـز، چەوسـاوە، داگیرکـراو، زیندانی کراو، ..) بە دژ بە دیالۆك لە قەڵەم دەدەن، کەچـی سـاڵی (2001)کۆمـەلیك رەوشـەنبیر داوای دیالۆکیان کردلە بارەی سەربەستی دان بە کورد بەزمانی خۆی بدوێ و بنووسی لە تورکیا ئـەو تەقەلایە بە تیرۆر لەقەڵەم درا، نیو سەدەشە دیالۆکی نێوان ئیسرائیل و عەرەب.. هەمووی هـەروەك سەرەنجامی دیالۆکەکانی جارانی ئیمپریالیزم و داگیرکەران لەگـەڵ داگیرکـراو و چەوسـاوەکانە، یـەك نموونە نیە لە مێژوودا زۆرداریك مافی لە رێی دیالۆك گێڕابێتەوە بۆ خاوەنی، تەنانەت بەشـی هـەرە زۆری ئەو دیالۆگانە پیلان بووە یان بۆ راگرتنی بەرگری و خۆ ئامادەکردنی یان هـەر بـۆ تیرۆرکردنـی راستەوخۆی سەرکردەکانیان، داگیرکەری ئیسـپان داوای گفـت و گـۆ و دیـالۆگی لەگـەڵ (لامـپیرا)ی سەرۆکی هندیە سوورەکانکرد - کە تایفەی (مایا) لەوێ دانیشتوانی رەسەنەکەن لە هنـدۆراس[*] — لامپیرا 30 000 چەکداری هەبوو و ئامادە و قایل بوو بەرەسمی کەوتنە دیالۆگ و دانوستان کەچی لەو دیالۆگە تیرۆریان کرد و خاکیشیان داگیر کرد، لە قۆناغی نوێش دیالۆگەکەی حکومەتی عێراق و ملا مصـطفی بارزانی بوو لە پایزی 1971 ویستیان تیرۆری بکەن سەرکەوتوو نەبوو، هەروەها ئـەو دیالۆگە تەلەفۆنیەی نێوان رووسیا و جەوهەر دودایڤ - لە شۆرشەکەیان بۆ سەربەخۆی چیچـان لـە دوای نەوەتەکانی سەدەی ڕابووردوو- کە بووە هۆی تیرۆر کردنی ، هەروەها د عبد الرحمن قـاسملۆش، .. سەدان نموونەی تر.

لە فلسفەی مارکسی باسی ( ئایدیۆلۆجیای ئیمپریالیزمی )کردوە ،لە قاموسی سۆڤیەتی دەلێ ئایدیۆلۆجیایەکی چینایەتی دژ بە زانست وپێشکەوتنە دەیەوی جەوهەری راستەقینەی خۆی بشاریتەوە[728]... ئەو ئایدیۆلۆژیایە پێی دەووترێ ئایدیۆلۆژیای داگیرکەر .

<u>لە بەرامبەردا:</u> ئایدیۆلۆژیاو فەرهەنگی داگیر کار هەردەم جیایە لەگەل فەرهەنگ وئایدیۆلۆژیای داگیرکراو نەك هەر لە پەروردەو ڕاهێنان وبیرو باوەڕو تەنانەت لە ناوو زاراوەو... وەك لەسەروو باس

---

[*] ئەو ناوە لەوە هات کە کۆلۆمبس لە دەریاچە قووڵەکەی رزگاری بوو، ناونرا قووڵ (هیندۆراس).

[728] یۆری بۆمارۆف - قاموس السیاسی ص94.

کرا، وەك کاردانەوەی فەرهەنگ وئایدیۆلۆجیای داگیرکەر میلەتانی ژێر دەستەش لە تەقەلای قەلاچۆی کاریگەری وئاسەوارەکانی ئەو جۆرە ئایدیۆلۆجیەن ، کە دیاردەی جاشایەتی و قۆلی پینجەم و (فرق تسد) و چەواشەکاری دروست دەکات ، مەرجیش نیە هەمو جاریٚ جاشی خۆوولاتی بەکارهێنابیێت ،جاروایە سەربازی عیراقی بردبوە قوبرس ودەریای ناوەڕاست ،بۆعیراقیش سیکەو گورگەی هندی هێنابوو - لە کوردستان باس لە جۆرە سوپایەکی تری بریتانیا دەکرا ناویان سیکەو گورگە بوە زانیاریەکان وابوو کەلەهند هیناویەتی ، دوای لە کتیبی(**لی کوان– العالم الثالث الى الاول ص32**)هەروەهاکتیبەکەی(دعلی اکبرولایتی–موسوعه الاسلام والایران)ئەسلی ئەوانەمان بۆدۆزرانەوە کەسیکە (سیغ)وسیگەکانی پەنجابی هندن، ،هەرچی گورگەشە ئەوەمیلەتیکی گۆرکی نیپالین ئەوانە زیاتر لە بواری پۆلیسی کاریان کردوە ،ئەوانەی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی رق وقین لەیەکتر نەك بریتانی، بەلام هەندیکی تر دەلین گورگە (گۆرگانی) وناوی پاپریشیان پیٚ دەووتریٚ ،دەلین دەگەڕێنەوە سەر نەوەی تیمور لەنگ ، بە مەغۆلی هند ناوزەد دەکرین ،ئەوانە حوکمی هندیان کردوە [729] .. لەوەوە هندیەکان ووتویانە ئەگەردووماسی لەدەریا بەشەڕ هاتن دەستی ئینگلیزی تێدایە ، لەبەرامبەر تێکڕای تەقەلای ئیستعمارو داگیرکەریش فەرهەنگ وزاراوەی تایبەتی میلەتانی داگیرکەریش پەیدا دەبێت ،زاراوەی تایبەتی لەو پرۆسانە پەیدا بوو ،وەك(ئەپارتاید،شۆڕش،خەبات، ئیسمپریالیزم ،نمر من الورق، ...)، لە ئەفریقا زاراوەیەکی تر بەناوی (گۆردیما)کە لە رۆمانیکیان هاتبوو ،گوزارشی لە ژیانی گوندی ناسنامە ڕەسەنی ئەفریقی دەکرد ،کەچی کە شاری دەبوون ناچار لە فەرهەنگ وشارستانی رۆژئاوایی دەتوانەوە [730] ،هۆیەکەشی ئەوەیە مادام نمونەیەکی ئامادەی شارستانی وفەرهەنگی شاریت نەبێت ئاوات بەسەردێت ،لەوەوە لەو رۆمانە وەك خۆ پاریٚزی لبەرامبەر ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر گوندو خێل وپەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی خۆیان کردبوە سوپەر بەرامبەر ئەو فەرهەنگ وئایدیۆلۆجیایە ، ئەوەی زیاتر جۆشی بە ئایدیۆلۆجی داگیرکەرو ئیستعماردا ئەوەبوو لەدوای رزگاری حزب وکەسە شۆرشگیرەکان بەشی زۆریان بەرەو تاك حزبی و دیکتاتۆری چوون ، یەکیٚ لەو تەقەلایانایەی ئەفریقا (مۆبۆتۆ)ی سەرۆکی ئەفریقای ناوەڕاست لە دوای سالانی

---

[729] د علی اکبر ولایتی – موسوعه الاسلام والایران ص328 .

[730] بۆ ئەو سەربردەیە بڕوانە :مایکل ریبون –النارالسوداء حرب العصابات فی رودیسیا ص117

1971هەستا بەدروست کردنی سیستەمیکی پۆلاینی تاك حزبی (جولانەوەی میلی بۆ شۆڕش- de la Révolution Mouvement populaire ) تا فەرهەنگیکی زائیری جیا لە ئیستعمار دروست بکات ، ناوی وولات وڕووبارو شوینە گشتیەکانی گۆڕی وزمانی (لینگالە)ی سەپاند ، پەڕیەوە بۆ جل وبەرگ وناوو نازناوی ئەفریقی و بەرەو دەستکاری ئاینیش رۆیشت وختیە پرۆگرامی خویندنیش ،ناویشی لەخۆنا (بانگا مۆبۆتۆ سیسی سیکۆ کوکو نگباندۆ وازا) بەمانای مۆبۆتۆی تیکۆشەر یسەرکەوتو هەرسەرکەوتو بیئەوەی کەس بیوەستینی) ، لەقاموس (حزب البعث) پێی وایە هەریەکە لە (کۆمەلەوحزبی بیردەرەکی —گەلالە ئابوریە برجوازیەکان-هاندانی فەرهەنگ ونەریتی دەرەکی —دژایەتی کەلتوری عربی) ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر دروست دەکا[731].

بۆیە زۆر جار ئەوانەش بە دیویکی تری ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر وەسف کراون ، لە ڕاستیدا میلەتی داگیرکراو لەو سەردەمە دەبێ زۆر ووریا بیت لە ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر ، ئەگینا گیانی بەرگری دەکوژی بەبێجەنگ هەروەك کتیبیکی (نیکسۆن)هەیە باس لەسەرکەوتنی بیجەنگ دەکات ، ئیستا ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر ئاوا زەق نیە بیناسیەوە ،بەلکو خۆی دەمامك کردوە ،خۆی لولداوە لەگەل مەدرەسەو تەیارو پرۆژەی چارەسەری کیشەکان ، ڕەهەندی ئەو ئایدیۆلۆجیە لە زۆربەی سیستەمەکانی جیهانی نوێ بەدی دەکریت هەروەك (موسوعەی ستانفۆردی ئینگلیزی) دەلیت یاساو سیستەمەکانیش گوزارشە لە ئایدیۆلۆجیای سیاسی زال ، لە عەولەمە لە بازاڕی ئازاد و کۆمەلگەی پراگماتیکی ولە ئازادی ومافی ئافرەت وزۆریك لە مافە مەدەنیەکان و تا دەگاتە خودی عەلمانیەت و ڕاڕەوی سیاسەتی میکافیلی ئەو رەهەندە بەدی دەکریت، دەلێن زانستی سیاسی بریتیە لە میکافیلیەت ، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە داڕێژەرانی عەلمانیەت لە قوولایی میژوو دەبینین پەیوەندیەکی راستەوخۆی بە ئایدیۆلۆجیای داگیر کەر هەیە ،دژبە ئازادی بووینە ،واتە بیبڕوای وداگیرکاری و دژی ئازادی پیکەوە کۆبووینەوە لێیان ،لەمێژوودا یەکەم زانا کە هەولێ جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی داوە سینکا(4-65م) فەیلەسوفی مولحیدی رۆم بووە هەم مونەزیری داگیرکاریەکانیش بوە ، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) هەم عەلمانی بوە هەم دژبە

[731] تعريفات ببعض المصطلحات —مكتب الثقافة والاعلام ص56

بنەمای ئازادی و دیموکراسی بوە، زینۆن(300 پ ز)بۆ پاپای ئەسینا،مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(60-120) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو.. ئەوانە بە (ستۆیلی)ناوزەد دەکران -ماستاوچی،یان جاریش وایە پێیان ووتراوە(لووکی)،بە هەمان شیوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی..،رۆفائیلی هونەرمەند وینەی ئەرستۆوئەفلاتونی لەتەنیشت یەك وا دروست کردبووئەفلاتون ڕووی لە ئاسمان وئەرستۆش رووی لە زەوی بەو مانایەی یەکەمیان لاهوتی و دوەمیان ناسوتی، ئەفلاتون ئاینی ولەڕێزی میلەت بوە وەك جون لویس دەلیٚ دەنگی میلەت وشاری بوە ،ئەرستۆش(باوکی عەلمانیەتی هاوچەرخ) لە خزمەت داگیرکەرێکی وەك فیلیپی مەقدونی بوە، دوایش بوە فەیلەسفی رەسمی ئیمپراتۆریەت ومامۆستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایەتی بوو، میکاڤیلی بۆ بنەمالەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و...زانای هۆلەندی هۆگۆ گرۆتیۆس(1583-1645)بە دامەزرینەری یاسای دەولی وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکریٚ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بوە ...بەوشێوەیە .

لە هەموان زیاتر ئەو جۆرە سیاسەتی بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەکارهاتوە ،دوای جیگیربوونی ئەو نەخشە سیاسیە لە رۆژهەلاتی ناوەراست کۆمەلیك بنەماشی بۆ دەرچوو، تا بواری دەستکاری وچاکسازی تیدا نەمینیت،لەوانە: عدم المساس بالحدود الاستعمارية الموروثة، بنەمای ئایزنهاور، ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل، بنەماکانی( ترومان-نیکسون –کارتر).. هتد،مانای وایە هەر گۆڕینیك لەو نەخشەیە رووبەرووی دوو کۆسپی زۆر گەورە دەبیەوە: یەکەمیان بەرژەوەندی بالای ئیستعمارو (ئیستا رۆژئاوا) دوەمیان ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل، واتە هەر خودی ئەو دابەشیەی رۆژهەلاتی ناوەراست بە پێی ئەودووستاندەرەیە، کەواتە لێرەوەو لەدوایش کە پرۆژەکانی چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەراست دەبینین جوان تێدەگەین تیۆری(تقسيم المقسم وتجزئه المجزأه)چەندە پووچ وبیٚ بنەمایە،تەنها زەمینەی تومەتە دژ بە میلەتانی ژێر دەستەی ئەو ناوچە ،لەبەرامبەردا ..بزوتنەوەکانی رزگاریخوازو نیشتمانی و بوهارەکان دەبیٚ ووۆیابن لە هەلبژاۆدنی ئایدیۆلۆجیا ,جاریٚ ئایدیۆلۆجیایەکی خراپیش لە بێئایدیۆلۆجیایی باشترە ،خودی بانگیشەی (ئایدیۆلۆجی سەلبیە)یان (سەردەمی ئایدیۆلۆجی نەماوە) بەشێکە لە ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر.

ئامرازوئامانجەکانی ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر: هەندیك دەلین هەمو ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر سەلبی نیە هەندی جیاوازی لەنیوان ئایدیۆلۆجیای ئیمپریالی کۆن و وئایدیۆلۆجیای داگیرکەریکی دەڤەری نویٚ هەیە ،ئەوەی یەکەم زیاتر سەربازیە وجاروایە زیادکردنی دەسەلاتی ئیمپراتۆریك یان هەریمیکی ستراتیجی بوە ، هەموجارئیستعمار هەولی توانەوەی فەرهەنگ و زمان و رەگەزناکا ،جاروایە ڕاستیان کردوە خزمەتی کۆمەلگەیەکی دواکەوتوویان کردوە ،وەك لە سیستەمی ئینتدابەکانی (A-B-C) بینیمان وولاتانی ئەفریقاو عەرەبی سەربەخۆی لیٚدروست بوو لە نمونەی سەلبیش داگیرکەر فرنسا بۆ ئەفریقا ،لەوەوە هەندیٚك بە ڕەهایی دەلیٚن ئیستعمار زیان بەخشە ،لەوانە تۆکفیل دەلی پیش داگیرکردنی جزائیر لەلایەن فرنسا گەشە هەبوو لەدوای سەدەیەك 5٪ی خویندەوار بوون ، فلسفەی مارکسیش بەتەواوی پالپشتی ئەو بۆچوونەیە ، نمونەیەکی تری میٚژووی هەیە ڕەچەلەکی دیموکراسی دەدریٚتە ئەزمونی یۆنانی کۆن بەلاّم بە پیٚی هەندیٚ تویٚژینەوەی میٚژوویی ئەوانیش لە فارسیان وەرگرتوە دوای داگیرکردنیان،ئەوەش دەردەکەویٚ بە پیٚی ئەو مشت ومڕەی کەلەلایەن (هیرۆدۆتس)ەوە لە522پ زنەقل کراوە لەدوای ئەوەی فارس ناوچەکانی ئەوانی داگیر کردوە سیٚ جۆر حوکم باس دەکاو لەکۆتایی دا لەسەر پیٚشنیاری(ئۆتانۆس شیٚوەی ئیزۆنومیا)هەلدەبژیٚرن کە شیٚوەیەکی هاوشیوەی دیموکراسیە،هەربۆزانین ئەو جۆرە کۆبونەوە گشتیانەی (شیٚوە دیموکراسی)ناوی جیاجیای هەبوو لە ئەسینا پیٚیان دەووت(ئەکلیسیاس) ،لە ئەسپارتە پیٚی دەووترا (ئەپیلا) ،لەعەجەم پیٚی دەووترا (ئیزونامە) .

لەسەروو باسی کۆمەلیك زاراوە کرا تایبەت بەو میلەتانەی بەرگەی گەشەو مانەوەیان لاوازە ،تا بتوانن بەرپرسیاریەتی ئیقلیمەکەیان بکەن ،لە قۆناغیکن نیشتمان لایان تەنها مانا کلاسیکیەکەی کە مولك و لەوەڕی تیرەو خیلەکەی بەنیشتمان هەژماردەکا، لیٚرەوە مانای نیشتمانی بیٚخاوەن بەرجەستە دەبیت ، رەنگە داگیرکەر بۆ ئەو شوینانە بەو ئەندازەیە ئایدیۆلۆجیاو فکرو فلسفەی نەویٚ ،رەنگە تەبشیریەك بەس بیت ،بەلام بۆ هەندیٚ میلەت ووولاتی تری گەشەسەندوو پیویستی پیٚیەتی ،بە پیچەوانەی بۆچونەکەی (ئەنجلس –لەبارەی نەتەوەی ڕەسەن ونارەسەن) لەو سەردەمە زۆربەی

داگیرکەران نەتەوەی ڕەسەنی ناوچەکە نەبووینە، بەڵکو داگیرکراوەکان ڕەسەن تر بووینە[*]، باسك نەتەوەی ژێر دەستی ئیسپانیا و بەشێکیشی لە دەست فەرەنسیە، کەچی لە هەمو ئەوروپا مێژوویان قوڵترە، بەهەمان شێوە بەربەریەکان بەرامبەر عەرەب و ئەفریقیەکان، تامیلیەکان بەرامبەر سەنهالیەکان لە سریلانکا، هەروا تبت، کشمیر، فەڵەستین، دانیشتوانی رەسەنی هەردوو ئەمریکا و ئوستراليا، کورسیکیەکان بەرامبەر فەڕەنسا، ئێرلەندیەکان بەرامبەر ئینگلیز، هەتا ئەسیوبیاش شارستانیەکی کۆنی هەیە کەچی تگری لەوی ڕەسەن ترە ... بەهەمان شێوەش کوردستان بەرامبەر وڵاتانی وەك عێراق و تورکیا..، ناویشی لە پێش ناوی عێراق و تورکیاو.. لەوانە نەك پیویستی بە ئایدیۆلۆجیاو فەرهەنگ و فکرو فلسفە بەلکو پیویستیەکی بەردەوامی هیزیش هەیە ، تا کۆمەلیك ئامانجی ئالۆز وناکۆك بهینیتە دی،لەوانە :

1-میللەتی داگیرکراو گەشە نەکا بەرەو مەدەنیەت و ڕووناکی و شارەزایی.

2-هەردەم دەیەوێ سیاسەتو ئاین ومەبادیئو گیانی نیشتمانی لیك جیا کاتەوە.

3-یەکپارچەیی و گیانی هاریکاری و زیندەکی و هەست بە ئازادی و دیموکراسی نەکا.

4-هەوڵدەدا پەیوەندی نێوان خاك و میللەت ومێژوو لاواز بکات.

5-هەوڵدەدەن بەرژەوەندی تایبەتی و خۆویستی زاڵ بکەن بەسەر هەست بەبەرپرسیاریەتی و بەرژەوەندی گشتی و خۆشەویستی خاك و نیشتیمان و دژ بە زوڵم و زۆرداری.

6-بۆهەموو ئەوانە هەوڵ لەسەر کۆی ئەو هەنگاوانە لەسەر چاوەیەك دەکا ئەویش تەقەلای لاوازکردنی ئایین و ئەخلاق و مەبدەئە لەناو ئەو میللەتە، هەموو وڵاتێك بەتایبەتی میللەتانی ژێر دەستە بۆ ئەوەی نەتوێتەوە، بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت، ئەوا پێویستی بەوە هەیە ژێرخان و ڕووحی کۆمەڵگەکەی بپارێزێت کە بریتیە لە ئایین وئایدیۆلۆجیای خۆمالی و بنەماکانی هاریکاری.

7- تقزم کردنی کۆمەلگە (گەوجاندنی) هەردەم هەولی داگیرکەر ئەوەیە میلەتیکی نەفام ولاسایی کەرەوەو بێداهێنان بێت ،دوور بێت لە عەقلانی وزانست وفکرو فلسفەو ماریفەت ،نمونەیەکی

[*] ئەوەش هەر نیشانەیەکی ئاشکرای بێ داگیرکاری (ئایدیۆلۆجیا) جیهانە کە لە قورئان وەسفی دەکا (إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ).

نزيك لەو دۆخە لە سەردەمی **محمد علی** پاشای میسر (1830-1845) بەرنامەی گەشەو پیشكەوتن دارژرابوو ،هەمو ئەو تەقەلایانەی بۆ بە تكنۆلۆجیا بوون ڕاوەستینرا لەلایەن ئیستعمار، لەدوای داگیر كردنی لە 1881 ، تا ڕادەیەكی زۆر دەقی فقهیش بەكارهاتوە بۆ ئەوەی لە زانست وقوولبوونەوەو فكرو فلسفە دووركەونەوە .

لە دەولەتی عیراقیش بە جۆریكی تر ئەوە بەدی دەكرا ،ساتیع حوسری گەورە بیریاری فكری عروبی ببوە وەزیری پەروەردەی عیراق ،ئاینیەكان خۆپیشاندانیان كرد دژی بەهۆی بە عەلمانی كردنی پرۆگرام و دروشمی **(لااله الا الله ساطع عدواللاه)یان** دەووتەوە ،زۆر هەولی تریاندا نەیانتوانی لایدەن دەركەوت بریتانیا وای داناوە كە ئەو لانەبریت [733] .

<u>ئامراز-شەڕی فەرهەنگی وئایدیۆلۆجی پیش داگیركاری :</u>

هامفەر لە یاداشتەكانی خۆی دەلێت ئیمەی بریتانی ژیانمان لەگەل فتنەیە ئەو بوەستیّ ئێمەش دەوەستین هەربەو ئامرازەش دەتوانین وولاتان داگیربكەین بەوەش وولاتی عوسمانی واتیّكدەدەین[734] .

لەكۆنەوە دووشێوەی بنچینەیی لەداگیركەر هەبوە ،یەكیان داگیركەریكی سەربازی پەتیەو زیاتر مانای داگیركردنی خاكە وئەوەی دوەمیش داگیركەری سەربازی و فەرهەنگیەو مانای داگیركردنی خاك وتاكە ،ئەوەی یەكەم تەمەنی لەگەل بوونی سەربازیەكەی بوەو دریژ نەبوە،جاریش وایە پیچەوانە بوویتەوە لەبەر لاوازی فەرهەنگی داگیركەر خۆی توایتەوە لەنێو كۆمەلگەیەكی ئایدیۆلۆجیدار ،وەك ئەوەی ڕوویدا لەنیوان كۆمەلگەی ئیسلامی ومەغۆلەكان ، ئەوەی دوەم درێژبوە بەو ئەندازەیەی كارلێكی فەرهەنگەكە لەگەل میلەتی داگیركراو وەك لەنامەكەی ئەسكەندەر بۆ ئەرستۆ دەردەكەویّ (لە خواروو) .

ئەوەی دوەم لە میژوودا قوولە بەلام كەمتر كەوتە نیو تویژینەوە تا سەرهەلدانی پرۆسەی زال كردنی فەرهەنگ ورەوشەنبیری فەرەنسی بەسەر موستەعمەرەكانی فرنسی لە ئەفریقا، دەركەوت ئەوە هەر داگیركاریەكی سادەی خاكی وولات نیە ، بەلكو داگیركاری خاك وفەرهەنگ ومێژوو وتەواوی

---

[733] **الامام امجد الزهاوی –كاظم المشايخی ص**180

[734] ملحق مذكرات هامفر –دكتور اليمانی الفخرانی ص23

مقەوەماتی میلەتەکەیە ،بۆ ئەو مەبەستەش پیویستی بە ئایدیۆلۆیا وئاین وخێرخوازی وبە هاناو .. هەیە .

بە سانای دەتوانین لە پرۆسە میژووییەکان ولە واقعی ئیستاش بە گوزارشی جیاجیا ئەو ئایدیۆلۆژیە بدۆزینەوە ،لەکۆنەوە ئیمپراتۆرەکان مونەزیر و ڕاوێژکاری زانایان هەبووە بۆ هەڵسوڕانی ئیدارەی وڵات، بەشێکیش لە فەیلەسوف و کۆمەڵناس و جوگرافیناسی گەورەش بۆ (داگیرکاری وفتوحات) تەرخان کرابوو، ئەرکی ئەوانە ئەوە بووە ڕێنماییدەر بۆ وڵاتانی نوێ و چۆنیەتی زاڵبوونی بەسەر میللەتانی داگیرکراو، کۆن ترین و ڕوونترین بەڵگەنامە لەو بارەیەوە (وە لەبارەی فرق تسد)ئاڵوگۆڕی نامەی نێوان ئەسکەندەر و ئەرستۆ بوە لەبارەی خاکی عەجەم ،ئەوەش دەقی نامەکانە:

- نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة، وأنه رأي لهم هيآت وخلقا، لو كان عرف حقيقتها، لما غزاهم، وأنّه إنّما ملكهم بحسن الاتفاق والبخت، وأنّه لا يأمن - إن ظعن عنهم - وثوبهم، ولا تسكن نفسه إلّا ببوارهم. وەڵامی ئەرستۆ: « فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب، فصاروا أعداءك وأعداء عقبك بالطبع، لأنّك تكون قد وترت القوم، وكثرت الأحقاد على أرض الروم منهم وممن بعدهم، وإخراجك إياهم في عسكرك مخاطرة بنفسك وأصحابك. ولكنى أشير عليك برأى هو أبلغ لك في كلّ ما تريد من القتل، وهو أن تستدعى أولاد الملوك منهم، ومن يستصلح للملك ويترشح له، فتقلّدهم البلدان، ويتوليهم الولايات، ليصير كل واحد منهم ملكا برأسه، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم. »[735]،بەو شێوەیە یەکەم بنەمای (ئایدیۆلۆجیای داگیرکاری) لێرە دێت ، هەر لەو هەڵمەتەی ئەسکەندەر ولەپیناو لاوازکردنی بەرگری میلەتان بۆ داگیرکاریەکەی ئەوا دوو قوتابی فیساگۆرسی هێنابوو لەگەڵ خۆی، بەناوی (مەرزنۆس) و(ڤلانۆس) ئایدیۆلۆژی یۆنانیان وهیلنیستیان لە ناوچە داگیرکراوەکان

[735] دەقی ئەو نامانە لە کتیبی ابن مسکویە(ج1 تجارب الأمم ص23) وەرگیراوە.

بلاودەكردەوە[736]، لەو سەردەمەش هەمان پلان پیادەكراوە،فرق تسد بوویتە دروشمی ئایدیۆلۆجی هەمو داگیركەریك ،داگیركەر لە فرق تسد وتەبشیری مەبەستی هەلتەكاندنی بناغە كۆمەلایەتیەكانە كە بەرگری لیێشین دەبیت ، (فرانتز فانون)دەلیت : بەپیێی ئەزموننمان بۆ داگیركاری ئەواڕووبەڕووبونەوەمان لەگەل تەبشیری بۆ وولاتانی داگیركراولەلایەن داگیركەرەوە وەك قەلاچۆی میش ومەگەز پیویستە[737]، بەگشتی فاكتەرەكانی ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیای نادروست كەسێتیەكی لەرزۆك دروست دەكا،بە ئاسانی وولات وناخیش داگیر دەكریێ ، كەواتە دەتوانین بلێین  یەكیێ لە ئامانجەكانی ئایدیۆلۆجیای داگیركەر ووردوخاش كردنی خودی ئایدیۆلۆجیایە ،چونكە ئایدیۆلۆژیاو ئاین ومەبادیئی دروست بەشێكە لەتەواكەری كەسیێتی بەبەرگری،خودی چەمكی ئایدیۆلۆجیا سەلبی نیە وەك ئیستا باو بوەو ئەو بابەتەشمان زیاتر ناشرینی دەكا، بەلكو دەستكەوتێكی عەقلی مرۆڤایەتیە ئەگەر لەشوینی خۆی بەكاربهینریێ ، بەپیچەوانەوە نەبوونی  وادەكا كەسێكی لەرزۆك وڕاڕاو كریێگرتە بیێ ،داگیركاریت قەبول بیت ،بەرگریت نەبیت بەتایبەتی بەرامبەر داگیركاری،بۆیە ئاین وئایدیۆلۆجیاو فەرهەنگی دروست لەسەر ئاستی كۆمەلێگەش دەبیێتە هۆی تەبایی و(ضبط اجتماعي) و هاریكاری و لیێبوردەیی و بەزەیی و وەفا و خۆنەویسی بلاۆدەبیێتەوە ،بەگشتی ڕیێگرە لە زالێبوونی بەرژەوەندی تایبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتی كە فاكتەری هەرە بنچینەیی دروستبوونی چەمكانی وەك كۆمەلێگە و نەتەوە و حیزب و تاقم ودەزگایە كە دەروازەی یەكەمی پیشكەوتن وداهینانە لەلایەك ولەلایەكی تریش بۆ خۆشەویستی میلەت ووولات وئینتماو بەرگریە،لیرەدائایدیۆلۆژیای خۆمالی بەپیێچەوانەی ئایدیۆلۆژی داگیر كەرە، ئایدیۆلۆژی داگیركەر دەیەویێ كۆمەلێگەیەكی پر لە تاوان وبیێسەروبەر دروست بكا،كۆمەلێ یاسایەك هەیە لە فەرهەنگ و ئەنسكلۆپیدیەكان بەناوی (قوانین اجتماعیە الكونیە- Univarsal social law)هاتووە وەك دەقی خۆی (ژمارەی تاوان لە

---

[736]- ابي الفتح الشهرستاني- الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بيروت، طبعة الأولى ج3 ص79 – لة( قصة الحضارة – ج13 ) لة 529 باس لة رؤيشتنى زؤريك لة فةيلةسوفان كراوة بؤ ئةو شوينانة.

[737] فرانتز فانون- معذبو الأرض، ت :جمال اتاسى ص17

کۆمەڵگەیەك زیاد دەكات ئەگەر ئایین ڕۆڵێكی پەراوێزی هەبێت[738]، بەو شێوەیە چۆن داگیركەر دەیەوێ مەبادیئو ئایدیۆلۆژیاو سۆسیۆلۆجیات لەناوبەرێ ئاواش پێی خۆش نیە ئایندار‌بیت،تا هەم گیانی بەرگریت لاواز بیت هەم داگیركاریشت قەبوول بیت. ماوتسی تۆنگی سەرۆكی پیشووی چین لە ئەزمونەكانی خۆی سەبارەت بەبەرگری و ڕووبەڕووبونەوەی ئایدیۆلۆژیای داگیركەر ووتبووی: ئاینیكی بە هیزم لە وولات نەبوو بۆیە كۆنفۆشیۆسیم زیندووكردەوە شان بەشانی شیوعیەت بۆ ئەوەی میلەتەكەم توندو تۆل بكاو بەرگری دەرەكی وناوەكی بۆ دروست بیت[739]،ئەزمونی مێژوویەكانیش بەهاوار پێمان دەلێن ئەوانەی وولات فرۆشن ئاین ومەبادیئو ئایدیۆلۆژیان نیەو نەبوە ،یان بەهۆی پرۆسەی داگیركاری پیشوەخت تیكشكیندراوە، (ولید بن یزید)یەكێكە لە خەلیفەكانی ئەمەوی و باوەڕی بەخوداو قورئان وزیندووبوونەوە نەبوە [740]، خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)،ولایەتیكی تری بە(یوسف بن عمر )بە والی وكارمەندەوە فرۆشت، ئیتحادیەكانی عوسمانی(لەدوای 1908)وعەرەبی كەنداو فلستینیان فرۆشتە یەهودیەكان بە دوو سینی لیرەی زێر[741]، لیبیایان فرۆشتە ئیتالیا بە دوو بەلەمی سەربازی [742] ،ڕووباری دیجلەیان فرۆشتە ئینكلیز بە 250000لیرە[743]، شیخەكانی كەنداو مووچەی مانگانەیان بە زێر هەبوو لەبەرامبەر فرۆشتنی وولات، (1- ابن السعود 100.000 جنیە، 2- الملك حسين- شريف مكة- 100.000 جنیە، 3- فهد الهذال 140.000 ربية، السيد الأدريسي 12.000لیرة..)[744]، تەنانەت(هامفەر) لە یاداشتەكانی لەگەل (محمدی كوڕی

---

[738] موسوعة العلم الاجتماع ل506. هەروەها بروانە: مەوسوعەی جودی ل255

[739] مەوسوعەی جودی ل81

[740] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72-73

[741] - اليهود والدولة العثمانية .. ص229

[742] يقول جوليتي- رئيس الحكومة الإيطالية عام1911م عن حكومة الإتحاديين: لقد طلبوا منا اذا كانت ايطاليا مستعدة للتنازل لصالح تركيا كتعويض لها عن ضياع ليبيا، عن سفينتين من أحسن سفن اسطولها.( الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص79)

[743] عباس العزاوي- العراق بين الأحتلالين- .. ج8- ص186

[744] عبدالرزاق الحسني - تأريخ الوزارات العراقية -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92 هەروەها د.على الوردى – لمحات.. ج5 ص37 هەروەها (الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص79

عبدالوهاب)دەلێت جاریکیان دوکانداریکی برادەرم زانیاریم لێ وەردەگرت بۆ دەولەتی خۆم(بریتانیا) ئەو دوکاندارە داوایەکی سیکسی ناخۆشی لیکردم ،منیش وەلامم بۆ بریتانیا نارد ووتم ئەو داوایە دەکات لەوەلاما ووتیان ئەگەر ئەو کارە خزمەتی بە ئامانج گەیشتنت دەکا لاریمان نیە[745]...بەو بارودۆخە جیهانی عربی بە خیرایی کەوتە ژیر دەستی ئیستعمار بێبەرگریەکی وا .

لەکاتی داگیرکاری کۆمەڵگە زیاترپێویستی بە هاریکاری و تەبایی و ئۆقرە و گیانی بەرگری هەیە،ئەوەش بە ڕوونی لەئامۆژگاریە بەناوبانگەکانی میکاڤیلی(1469-1547)بۆ دەسەلاتدارە

داگیرکەرەکان دەردەکەوێ کە لەیەکێکیان دەلێ: بۆ ئەوەی (ئەمیر) زال بیت بەسەر میلەت پیویستە میلەتەکە دوورخاتەوە لە ئەخلاق وئاین[746]، زۆر بە زەحمەت نمونەیەکمان دەست دەکەوێ میللەتێك لەژێر داگیرکاری ڕزگاریان بووبێ ئەگەریەکێ لەو سێ فاکتەرە (ئایین، ئەخلاق، ئایدۆلۆژیا)ی نەبووبێ، یان هەرسێك پێکەوە، لە چوار چێوەی پرۆژەی(ارض بلا شعب لشعب بلا ارض) کە لەکۆنگرەی لندن 1840 درایە بارمستون.پیشووتریشلە( **ارض قدیم لشعب القدیم**) یەکەم جار (لۆردشافینزی)لە ناوەڕاستی سەدەی 19 دایهێنا[747]، ئەو پرۆژەیە بەدوای وولاتێك گەڕان بۆ یەهودیەکان،سێ شوینیان بینیەوە (ئەمریکای لاتینی،هەندێ ناوچەی ئەفریقا-ئۆگەنداو کینیا لەوانە، هاتنە خوارووی بەغدا بۆ ناوچەی ئۆر)کە میلەتیان لێ لاوازە ،لە پرۆتۆکۆلەکانی یەهود ڕوون تر باس کراوە لە پرۆتۆکۆلی(11) دەلێ تا بتوانین زال بین بەسەریانا دەبێ(ان الأممین -غیر الیهود- کقطیع من الغنم، وأننا الذئاب، فهل تعلمون ما تفعل الغنم حینما تنفذ الذئاب إلی الحظیرة؟ انها لتغمض عیونها عن کل شيء) لە برۆتۆکۆلی10 باس لە تیك شکاندنی ژیرخانی خیزانی دەکا (فسوف ندمر الحیاة الأسریة بین الأممین، تفسد أهمیتها التربویة)[748] ،هەولی داوە جۆری سیاسەتەکە میکافیلیانەبێت وەك

745 د.الیمانی الفخرانی –مذکرات هامفر ص17

746 نیقولا مکیافیلی – الأمیر-تعلیق:موسولینی-ترجمة:خیری حمادی ص150

747 **د عبدالوهاب المسیری –فی الخطاب والمصطلح الصهیونی ص24 ص29**

748 بروتوکولات حکماءالصهیون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980بروتوکول رقم:(10 ،11)

748 مدخل الی الفلسفة ص47 ،49

له پرۆتۆكۆلی یەكەمی باسی دەكا بۆ ئەوەی پەیوەندی زانستی سیاسیش بە میلەت لاواز بكاو داگیركاریەكەی بە ئاسانی بچەسپیّلەلایەكی تریش هەولیداوە پیشڕەو هیمای میلەت بشكێنی ، بۆداگیركردنی میلەتان هەولدراوە پیشڕەوەكانی تێك بشكێنرێت ، دیسان لە(پرۆتۆكۆل ژ:1) واهاتوە : ان يحطم طليعة الشعب[نيشيي] وبذلك نضع قوة ارادة الشعب تحت رحمة اولئك الذين سيجردونه من قوة طليعته...

لاوازی میلەت مانای لاوازی ژێرخانە نەك كەمی ژمارەیان، مانای لاوازی ئایدیۆلۆجی ڕاست ودروستە ، لەمێژووشدا تا ئەو ساتە زۆر بەدەگمەن بینیومانە میللەتێك پەیوەندیەكانی نێوان میللەت و نیشتیمان و دەسەلاتی سیاسی بالای هەبووبیّ وداگیركرابیّ، میللەتێكی مەدەنی (ئومە) داگیركرابیّ، شەڕی نێوان دوو ئیمپراتۆر و جەنگی جیهانیەكان لەسەر ئەو جۆرە میللەتە بوە كە لاوازن، هەردەم داگیركار چاوی بڕیوەتە خاكی ئەو میللەتانەی پێنەگەیشتوون، وەك لە كۆنگرەكانی سایكس پیكۆ وسان ڕیمۆ.. ڕوون تر دەردەكەویّ، ئیمپراتۆر و داگیركەران لە كۆنەوە پێش ئەوەی بەرەو هەر ولاتێك بهاتبانایە بانگی جوگرافی ناسی و كۆمەلّناسی و زانا و فەیلەسوفانیان دەكرد، یان هەر لەگەلّ لەشكرەكان بەڕیّ دەكەوتن تاهەم سروشتی خاكەكە بزانن(عسكری) سروشتی میلەتەكەش(سیاسی)، هەولیداوە جۆرە ئایدیۆلۆجیەكی نامۆیان لە ناو بلاو بكاتەوە پیش ئەوەی هیزە سەربازیەكانیان بگاتیّ ،هەولیداوە پیش داگیركردنی خاك تاك داگیر بكا لەڕێی بیرو هۆشی بوە، جا ئەوە لە ڕێی لیك جیاكردنەوەی ئاین وژیان یان سیاسەت وئەخلاق یان بازرگانی و ویژدان ..ئەوانە هەموی كەلتوری ئایدیۆلۆجیای داگیركەرە، داگیركەر هەولیداوە بچیتە ئاستیكی بالا تر لە تیكدانی ژیر خانی میلەتی ژیر دەستە ،بۆیە لیكجیاكردنەوەی ئاین وسیاسەت ،ئەخلاق وسیاسەت ... دەگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی داگیركاری، یەكەم جار هەولی داوە ئاینیان لاوازبكاو ئایدیۆلۆجیای بەدیل بلاو بكاتەوە یان جاروایە بیّ ئایدیۆلۆجیاو ئاین كردن بەشێك بوە لە بەرنامەی داگیركاری واتە مەرج

---

[نيشيي] المراد بطليعة الشعب المتازون الذين يتقدمون طوائف الشعب ويتزعمونها ويقضون في أمورها، واليهود يركزون ضرباتهم على هؤلاء المتزعمين، فإذا حطموهم تحطمت تحطمت دون مشقة الطوائف التي تسير وراءهم بلا تفكير. محمد خليفة التونسي- الخطر اليهودي(بروتوكولات حكماء صهيون) ت: عباس محمود العقادالطبعة الخامسة 1980م ص67 .

نیە ئایدیۆلۆجیای داگیرکاری ئایدیۆبۆجیای بەدیل بێت بەلکو دروست کردنی بۆشایی ئایدیۆلۆجیش هەر بەشێك بوە لەو تەقەلایە ،( لورنس براون) دەلێ گەورەترین دیوار لە پیش داگیرکار وئیستعمار ئاینە[750] ، سەرکردەی پورتوگالی لە1515ز بە قلاچۆی ئاین وئایدیۆلۆجیا بەرەو جیهانی ئیسلامی هات[751]، کلادستون-سەرۆك وەزیرانی بەریتانیادەلێت ناتوانین جیهانی ئیسلامی داگیربکەین تا (قورئان) یان لەنێو دورنەخەینەوە[752]، بۆیەش لەجیهانی ئیسلامی لە کێ ئاین لاوازبوو لەوێ یەکەم پیگەی ئیستعماری لیدروست بوو ،بۆیە سەرسامی نیە یەکەم پێگەی (بەمورتاحی) ئیستیعمار لەجیهانی عەرەبی حیجاز بوە کە یەکەم پرۆسەی لێك جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەلاتی ئەنجامدرا لەنێوان (محمد کورِی سعود) و (محمد کورِی عەبدولوەهاب) لەسالی 1737ز کە ئاین بۆ یەکەم ودەسەلاتیش بۆ دوەم[753]، رۆجی غارودی هەروەهاش مەکسیم رۆدنسن دەلین ئیستعمار بۆ جیگیر بوونی خۆی لە وولاتانی داگیرکراو هەولی یەکەمی دەرکیشانی ئاین وکەلتوری رِەسەنی ئەو وولاتە بوە لەجێیدا ئایدیۆلۆجیەکی نوێ بتاشی ،بۆیە تەبشیری پیشرەوی ئیستعمارە ..[754]، مەبەستی بنچینە تەبشیری گۆرِینی ئاینی داگیرکراو بوە بۆیە پیشەنگی داگیرکاری بوە [755] ، لەوەش زیاتر (جورج کیرك )خاوەنی کتیبی ( موجز تاریخ الشرق الاوسط -A short History Of the Middia East ) دەلێ پرۆژەی ناشیۆنالیزمی عەرەبی (واتە عروبی) لە ( دار المندوب السامي البريطاني) دروست کراوە وەك بەشێك لە پرۆژەی داگیرکاری ، تەنانەت داگیرکەر هەولی داوە ئاینیکی بەهیزو بەرگر بگۆرِێ بە ئاینیکی تری سادەو بێ گیان ،بۆ ئەو باش بوە ئاینی ئیسلام کە پرِ بەرگریەو دژی داگیرکاریە نەمێنێ ،بۆیە ئاینی ئیسلامی رِاستەقینە هەرگیز ناشێت ونابێتە کەرەستەی هیچ داگیرکەرێك،هەر ئەوە نیە نابێتە ئامرازی داگیرکەربەلکو دەبێتە ئامرازی دژی داگیرکەر، ئەگەر بوە

---

[750] التبشير والاستعمار ص 104

[751] د.عدنان على رضا النحوى- المسلمون بين العلمانية وحقوق الأنييسان الوضعية، ط 1 1997م، ص10

[752] بنى مرجة- صحوة رجل المريض ص199

[753] د.صالح العابد —حركة الأستقلال العربى ص12-13

[754] روجيه غارودى-ماركسية قرن عشرين ص149 وص195 هەروەها مکسیم رۆدنسن لە کتیبی (الإسلام والماركسيه) ئەو باسە دەکات.

[755] هارى ماجدؤف- الإمبريالية من عصرالإستعمار الى اليوم ص67

ئامرازی داگیرکاری یان بوە ئامرازی بەرگری نەکردن ئەوە بەسوڕدراوی بەکارهاتوە وەك زۆر جار وابەکارهاتوە ، جورج کامبل لە کتیبی (الأفرقا الإستوائیة) لەگەل ڕای(جورج کارپنتر)هاوڕان و دەلین تەبشیری بە پیچەوانەی ئیسلام سەربەخۆیی نیشتمانی تێك شکاندوە لە ئەفریقا[756] ، ئەو ڕەوشەی مسیحی دوای (ح مسیح) واگونجێندرابوو بۆ رۆژئاواو ئیمپراتۆریەکان ، وەك(جان سۆل) لة کتیبی(المستکشفون فی القرون الوسطی)دەلێت لە داگیرکردن ودۆزینەوەو چوونیان بۆ ناو میلەتانی تازە دۆزراوە لەویٚ ئیستعمارو تەبشیری مسیحی ریك بوون لەقازانجی هەردوو لابوو هەرلەوە رۆسۆ دەلێت ئاینی مسیحی تەنها باسی ئاسمانە باسی کیشەی زەوی تێدانیە ،لەو بارەیەوە رۆسۆ دەلیت بۆدروست کردنی کۆمەلگەیەکی بێدەنگ واچاکە هەموی مسیحی بن چونکە ئینجیل باسی ئاسمان ودوارۆژە نەك ژیان وسەرزەوی[757] ،هاندانی پاپاو پیاوانی ئاینی بەردەوام بوو ..لەو بارەیەوە .

زۆر جاری تر ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر شیوازی تری وەرگرتوە ، هەندیٚ ڕیکخراوی بە ڕوالەت خیرخوازبوەو لە ژێرەوە مەبەستی تری هەبوە ، نمونەی باو ریکخراوی لوینزە ،بەو کۆمەلە یانە خیرخوازیانە دەووترا (لوینز)کە سەر بە دامەزراوە ماسۆنی ویەهودیەکان بوە بۆ بلاوکردنەوەی گەندەلی ولەناو میلەتان تا بەسەریان دا زال بێت لە ڕێی خێرخوازی ، لەسالی 1915 لە ئەمریکا دروست بوە ، شان بەشان وبەهاریکاری یانەکانی رۆتاری ، دەگۆتریٚ دوای ئەوەی ریکەوتنی ئاشتی ئیسرائیل و میسر (سادات وبیگن)مۆرکرا ئەو یانانە بە فراوانی لە میسر بلاو بووینەوە .

سەرەڕای ئەوەش هیشتا ئایدیۆلۆجیایەکی لاواز باشترە لە بێئایدیۆلۆجی ،ئاینێکی لاوازیش باشترە لە بیٚ ئاینی، لە ئەزمونی ئەپارتایدی ئەفریقا ورۆدیسیای پیشوو تیمی سپیەکان دژ بە رەشەکانیان دروست ببوو بەناوی(عصابە التمساح) ، بەردەوام لەهەولی تیکدانی ژیرخانی میلەت بوون تا بەرگریان نەمینی، هەول دەدرا بەهاو ئاینی ڕەسەنیان بتوینەوەو ئایدیۆلۆجیاوفەرهەنگی ئەوروپیان بەسەردا زال بکەن[758]، لەوە زیاتر (فرانتزفانون)دەلیت ئیمپریالیزم وداگیرکاری کەسیتی وسروشتی

---

[756] عباس محمود عقاد-مایقال عن الإسلام ص91 هةروةها: جورج کامبل-الأفرقا الإستوائیة ج2ص276

[757] روسو – فی عقدالاجتماعی ص208

[758] مایکل ریبون-النار السوداءحرب العصابات فی رودیسیا ص76- ،ص117

مرۆڤ تێك دەشیوینێ وعەقلیشی دوادەخا تا بتوانی زیاتر بمینیتەوە[759]، بۆیە لە بنەماکانی(تصفیه الإستعمار) واهاتوە:بۆ رزگاری یەکجاری پیویستە خۆت لە هەمو ئاسەوارەکانی ئیستعمار رزگار بکەیت[760].

<u>گۆڕانی ئامراز</u>: لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم ئامرازو ئایدیۆلۆجی داگیرکەر گۆڕا ،لە ڕێی یارمەتی ولەژێر دروشمی مرۆڤایەتی ..،لەژێر پەردەی رزگاری دێت، بەیانەکانی جنرالە گەورەکانی هاوپەیمانان ،لەوانە جنرال مود لە 1917/3/19، تیایدا بانگەوازیان ئەوەبوو ئێمە داگیرکەر نین بەلکو رزگارکەرین [761] ، ئامرازی نویێ ئەوەیە سنورو دەولەت و دیزاینی ناوچە لەقازانجی خۆیان دادەڕژن ، ریکەوتنامەی سایکس پیکۆ ودوای سیڤەر و دروست کردنی دەولەتانی ناوچەکە و...، هاتنی بیری عەلمانی و نەتەوەگەری، بیرۆکەی دەولّەتی نەتەوەیی..هەمو ئەوانە ئامرازی نوێو بالآن کە لەکۆتاییدا لە خزمەتی ئیستعمارین ، خزمەتیکی ئابووری وسیاسی ویاسایی وفەرهەنگی ناڕاستەوخۆ بەزەحمەت هەست پێدەکرێ ، بە عەلمانی کردن ولاواز کردنی ئاین لەهەمویان پیشەنگ تر بوە ،لەنامەکانی مس بیل(کە بەدامەزرینەری عیراق هەژماردەکریت)بۆ بریتانیا داوایەك دەکات لەنامەی رۆژی 1920/10/3دەلێت با مەرجەعەشیعەکان وئاینیەکانی جیهانی ئیسلامیش وەك دەسەلاتی پاپا قەتیس بکەین لەناوچەیەکی وەك ڤاتیکان ئینجا سیاسەتەکانی بریتانیا لە عیراق وناوچەکە سەرکەوتوو دەبێت[762] ، بەشیك لە ئامرازی نوێی ئایدیۆلۆجی داگیرکەر بریتیە لە نەهیشتنی خودی ئایدیۆلۆجیای بەرامبەر (میلەتان) ، بەشی هەرە گرنگی بەکارهێنانی ئاینە بە سووڕدراوی ، بۆ ئەوەی حوکمەکانی لاواز بکرێت ، بۆ ئەو مەبەستە گەلێ جار کریگرتەیی کراوە گەلێ جاریش بە خۆڕایی ونەزانی کراوە ، لە وانە (شێخ علی عبدالرزاق) (قازی شەرعی)ی ئەزهەریش بوو، لە سالّی 1925 کتێبێکی نووسی بەناوی (الاسلام و أصول الحکم)، تیایدا هەندێ ڕاو بۆچونی دەگمەنی تیادا

---

[759] معذبو الأرض- ص6

[760] تصفية المصالح الإمبريالية الأمريكية –عبدالكريم العبيدى ص48

[761] ينظر: أ- عبدالرحمن بزاز–العراق من الاحتلال الى الاستقلال ص65 ب- حركة الوطنية العراقية ص20.وكان هذا البيان أتي من لندن وأعده السير مارك سايكس، مخطط سايكس- بيكو.

[762] العراق فى رسائل مس بيل ص188

بوو، وەك ئەوەی (ئیسلام تەنها ئاینی گیانە نەك دەوڵەت، پەیامی محمد هەرگیز دەوڵەت و حکومەتی تیا نەبووە)[763] ، هەندێ ڕای وا پەیدابوو کە ئاین بە ئاسۆی بەکارنەهێندرێت تەنها پەیوەندی ستونی تاك وخودا، لە ئیسلامیەکانیش جار وابووە لەبەر هۆی ناکۆکی ماندوبوون بێئومێدی بە ئەنجامێك گەیشتوون وەك (أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة) کە لەلایەن (شێخ سعید نورسی) وتراوە.. ئەوانە هەر لە خزمەتی بیر و بۆچوونی عەلمانیەت نیە، بەڵکو ئیمپریالیزمی جیهانیش بە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەوە ئەوەیان مەبەستە بۆ دەرکێشانی گیانی بەرگری نیشتیمانی، هەر بۆیەش لەگەل داگیرکردنی کوردستان ودروست بوونی مەینەتی کورد دروشمی جیا کردنەوەی ئاین لە سیاسەت هاتووە، یەکەم جار ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی نوێ)کەلەلایەن بریتانیاوەدەردەچوولەدوای 1918- بانگێشەی (ئاین شتێکەو سیاسەتیش شتێکی ترە)ی بلاو کردەوە، ئینجا داگیرکەرەکانی تریش لەهەموان سەخت تر دەسەلاتی بەعس بوو سزاکەی تا ڕاددەی سێدارە بوو،صدام حسین لە کتێبی (نظرة فی الدین والتراث)بە توندی جەختدەکا دەلیێ: (المطلوب مناهو ان نکون ضدتسیس الدین)[764]،

کەچی لەلایەکی تریش زۆربەی پرۆسەکانی داگیرکەران بەناو زاراوەی کەلتوری ئیسلامیە، وەك ناوی ئەنفال، پەلامارە سەربازیەکانی بەناوی خالد بن ولید، قعقاع، توکلت علی الله،..کەچی ناوی دەسکەوتە زانستیەکان بە ناوی ئاشوری وسۆمەری وبابلی بووە.

ئەوانەو بەکارهێنانی تکنۆلۆجی بالای سەربازی باری بەرگری نیشتمانی زۆر قورس کردوە ،وای کردوە بەهەمو دەستەو تاقم ومەدرەسەیەك نەکرێ ، پێویست دەکا لەبەرامبەردا ئامرازی بەرگریش بگۆڕێ ، لە ڕاستیدا داگیرکەر و ئیمپریالیزم وبەرگریەکانی گۆڕا بەسێ قۆناغ: یەکەم لەسەرەتای رابوونی نەتەوایەتی ولاوازی تەکنەلۆجیای سەربازی داگیرکەران ئەوا بزوتنەوەکانی بەرگری نیشتمانی زیاترلە ئاستی توانای نەتەوەگەرییەکان بوو، قۆناغی دووەم: لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنەلۆجیای سەربازی چیتر لە توانای تەیاری نەتەوەیی نەما، ئەوجا نۆرەی چەپیەکان هات و پێشەنگ و سەرکردەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیان کردتا هەشتاکانی سەدەی رابووردوو، قۆناغی سێیەم و ئێستاش لە عەولەمەدا

---

[763] الاسلام و أصول الحکم ص64-68

[764] نظرة فی الدین والتراث ص14

بەرگری نیشتمانی لە توانای هەردوو تەیاری نەتەوەیی و چەپی نەماوە، تەنها بە ئایدیۆلۆجیەکی بە هێزی وەك ئیسلامیەکان دەکرێ .

نمونەی ئایدیۆلۆجیای داگیرکەری کوردستان: ئایدیۆلۆجیای داگیرکەری کوردستان وەك ئیستعمار نیە ،هەندی یارمەتی وئاوەدانی کردبێ ولە پال ئەوەش مەبەستی تری جیبەجێ کردبێ ،بەلکو داگیرکەریکی ڕەقەکاری ڕاشکاوانە بوە ، بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ویستویانە ژیرخانی کۆمەلایەتی ومیژوویی هەلتەکێنێ وئایدیۆلۆژیای تایبەتی خۆی بسەپێنێ، لەدوا هەنگاو حزبی بەعس ویستی بنەماکانی ئەو حزبە بەکوردستان بلاو بکەنەوە بۆئەوەی داگیرکاریەکەی ڕەسەن بکا،هەولیداوە فەرهەنگ و کەسایەتی کورد هەڵتەکێنێ بەهۆی بەتەماح کردنی و خۆویستی و مادی بوونی و...هەولّی داوە ئایین لە کوردستان لاواز بکا، بە سوتاندن و وێرانکردنی مزگەوتەکان چ بەناشرینکردنی لە ڕێ ی ناوی ئایینی لە پرۆسە عەسکەریەکانس دژ بە کورد،هەولّی داوە ئەو تەبایی و هاریکاری و ئەخلاقە کۆنەی کوردی لەناو ببا کە جاران ناوی قورەیشی عەجەم بوە، گوتاری سیاسی و هەلۆیستەکانی زیاتر ئاینی بوو، بۆیە لە سیاسەتدا زیاتر چەسپاوی و ڕاستگۆیی و ئەمەکی و... ،لەڕووی ئیداریشەوە هەردەم هەولیداوە کەسی ناشایستە لە شوێنی شایستەبێت بۆ ئەوەی کارگیڕیەکی سەقەتی بەکلتوور ببێت،(قالت ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها وجعلوا اعزة اهلها اذلة وكذلك يفعلون ) هەمو ئەوانەکارێکی زۆری کردبووە سەر بناغەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، کە بە قایمی نەتوانێ بەرامبەر ئایدیۆلۆجیای داگیرکەر بوەستێ.

لەژێر سەرکردەی رووحی ڕەنگە خاك و نیشتمانی داگیر بکرێ، بەڵام میللەتەکەی داگیر ناکرێ. کەچی ئێستا بە داڕوخانی ئەو بناغانە و جێگرتنەوەی ئەو بنەما لیبرالی سیکۆلارە کەبالی بەسەر میللەت کێشاوە لە: بێمتمانەیی، مەزەندەی خراپ، بێئەمەکی، خۆویستی، دوودڵی، بەرژەوەندی تایبەتی خستنە سەر گشتی، گوێپێنەدان، بێبڕوایی، ناچەسپاوی، بێ ئایدۆلۆژی،.. ئەوە لە کۆتاییدا میللەتێکی بێتوانا و عەوام و بێئیرادە و بەرگری لێ دروست دەبێ.

بۆ بەرپەرچدانەوە سەرکردە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێدانی رێنمایی و دادگەری و بیروبڕوا و پەروەردە و ئامۆژگاری.. کە لەخۆی و ژیانی ڕۆژانەو مێژووەکەی ڕەونەق بداتەوە، لەسەر ئەو

بنچینەیە دەتوانین بڵێین داگیرکەر بەخۆی ئایدیۆلۆجیایەوە توانیبووی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە خاکی کورد داگیر بکات، بەڵام نەیتوانیبوو میللەتی کورد داگیر بکا، هەتا دوای 1975.. ئینجا بەرەبەرە توانی میللەتیش داگیر بکا.. باش ترین بەڵگەش ئەوەیە بۆیەکەم جار لە مێژووی کورد ژمارەی جاش دە یان هێندەبە قەدپێشمەرگە بیت، ئامرازی جیاجیای تریش لەو کەلینە بەکارهاتوە ،بەهۆی ناکۆکی خستنە ناویان و هەڵخەڵاندنیان لە شوێنی خۆیان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگە و دروستکردنی (فوج) بۆهەرعەشیرەتێك بەناوی(افواج خفیفە) کە هەمان ناوە لەسەردەمی ئیتحادیەکانی عوسمانی لەدوای سالانی 1908 بۆ کورد کرایەوە ،هەموشی جۆرە ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەتی لەگەل بوە بەناوی یەك میلەتی یەك ولاتی یەك ئاینی ..لە عیراقیکی دروستکراو، لەکۆی ئەوانەش هەوڵی داوە پەیوەندی نێوان کوردستان و کورد لەیەکتر جیا بکاتەوە، پەیوەندی تاکی کوردیش بە (مێژوو و ئایین و فەرهەنگ و کورد و نیشتیمان) لێك بکاتەوە، تا ئینتیمای تاك بۆ میللەت و نیشتیمان لاواز بکا، کەسێکی یاخی و (لامنتمی) لیَ دەرچیَ.بەهۆی ژیاندنەوەی فاکتەرە ستونیەکانی عەشایری و دروستکردنی فەوج، تاکیش سەرقاڵ بکا بە ئارەزو بازی وباقی کارە لاوەکیەکانی تر، بەکۆی گشتی داگیرکار ویستوویەتی :

1- یەکەم هەنگاوی داگیری کوردستان لە لێکجیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت هات لە گەل گەیشتنی بریتانیا بە کوردستان، یەکەم جار لەرۆژنامەی (یەکیتی کورد) سەر بە بەریتانیا لە سلێمانی بانگیشەی بۆکرد،بۆ ئەوەی هەنگاوی لکاندنی خوارووی کوردستان بە عیراقی تازە دروست کراو سەرکەوتو بیت.

2-داگیرکەران (کۆمەڵگە- مجمع-) یان کردوست کرد،بۆ ئەوەی تاك وخاك لیکجیابکەنەوە (نامە وەلامی ئەرستۆ بۆ ئەسکەندەر بخوینەوە)

3-ژمارەی خۆفرۆش و جاش لەسەردەمی بوهاری عەلمانی دەیان جار زیادی کردوە .واتە دەتوانین بڵێین ئایدیۆ لۆجیای داگیرکەر زیاتر لە نێو زەمینەی عەلمانی جێی دەبێتەوە وکاریگەری هەبوە .

4-بۆ ئەوەی میللەتەکەمان ومیلەتانی خاك داگیر کراو دووچاری پەرتەوازەیی و خۆویستی و بیَ سەروبەی و بیَ ئینتیمایی نەبیَ، بۆ ئەوەی گیانی بەرگری نەمریَ، ئەوا دەبیَ چەمکی فەلسەفەی باوەڕ لەبەرامبەر چەکی کوشندەی ئایدیۆلۆجیای داگیرکەران دروست بکەن، داگیرکەر ئەو چەکەی (

بێ باوەڕی) بۆخۆی و لەنێو میللەتی خۆی بڵاوناکاتەوە، دەهێنێ لەناو میللەتی کورد میلەتانی تری داگیرکراو بڵاویدەکاتەوە.

5-بوونی جاش وخۆفرۆش و وابەستە بە داگیرکەر زیاتر لەنێو کۆمەڵگەی عەشایری بوە، ئەگەر لەناو رەوشەنبیرانیش بووبی ئەوە لەنێو رەوشەنبیرو نوسەرو خاوەن ئایدیۆلۆجیای عەلمانی بوە ، لێرەوە خالیکی گرنگ ئاشکرا دەبێت ، لە بنەچەدا شۆڕشەکانی کوردچۆن دژ بە داگیرو دابەشی کوردستان بوە ئاواش دژ بە عەلمانی بوە، چونکە زانیویانە مەینەتی کورد هەم لە ئەستۆی عەلمانی دایە هەم ریزی میلەتیش تێك دەدا، مەلا سلیم وشیخ عبدالسلام وئەوەی شێخ سعیدی پیران بە ڕوونتر لە دادگاییەکەی دەردەکەوێ کەلە گۆڤاری (گێرشەم)بڵاوکرایتەوەو دەڵێت: ئێمە دژی داگیرکەروعەلمانیەت شۆرشمان کردوە، بەتایبەتی کەبینیم لە جریدەی(سبیل الرشاد)عبداللەجودت واحمدناوێك نوسیبویان : موسابەلەخۆبایی و عیسابەناوبانگی و محمد بەئەمینی ..هەریەکە ئاینێکیان هێناوە، ئێمەش دەتوانین ئاینێك بهێنین، ئەو جۆرە بانگێشانە لەڕۆژنامەکان تەنیبۆوە ئێمەش شۆرشمان دژ بەوانیش کرد[765].

---

[765] دەقی گفت وگۆی دادگاییەکە لە: دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص512-523

(24)

**مافی چارەی خۆنووسی** **حق تقرير مصير** right of self determination

**ئەوانەش دەگریتەوە( ریفرۆندام ، مافی جیابوونەوە (حق الانفصال)، ئۆتۆنۆمی ،نۆمی ،گەل، فۆلك،** بلدالحبيس..)

فەلسفەی مافی چارەنوس لەوە دێت کە چۆن مەبەست لەدروست بوونی ئادەمیزاد(بەپێی بنەمای:**انی جاعل فی الارض خلیفة**) ئازادی بڕیارو چارەنوسی لەدەست خۆیتی،ئاواش بۆ هەمو میلەتیك كە بتوانێ ناسنامەو کەسایەتی یاسایی دروست بکا چارەنوسی لەدەست خۆی بیت نەك میلەتیکی تر بۆی دیاری بکا ،ئەگینا دەبیتە داگیرکاری ، لە کۆتای سەدەی 19 وسەرەتای سەدەی بیست لەگەل دروست بوونی جۆرە پەیوەندیەکی سیاسی لە نێوان تاك وخاك ودەسەلات، ئەو مافە بەرجەستە بوو لە نێو کۆنگرەو لێدوانە فەرمیەکان باوی وەرگرت،بەلام تادروست بوونی نەتەوەیەکگرتوەکان لە 1946 ئینجا بوە بەشیك لەیاسای دەولی بەناوی (مافی چارەنوسی میلەتان) .

ئەو زاراوەیە زیاتر بۆ سەرۆکی ئەمریکا(ودرۆ ونسن)دەگێرنەوە بۆ ئەو 14 بنەمایەی سالی 1918 جارِیدا لەدوای جەنگ بۆ دارِشتنەوەی سیستەمیکی نوێی جیهانی، کەچی لە کۆنگرەی لەندەنی ئومەمی سالی 1896 ناوی هاتوە دوایش کرا بەشێك لەبنەمای شۆرِشی ئۆکتۆبەری روسی 1917 ،دوای لە کۆنگرەی ڤیرسای بۆ یەکەم جار بەفەرمی باس کرا، بە خیرایی پەرِیەوە بوە دروشمی سیاسی بزوتنەوە رزگاریخوازەکان وشیوعیەکان،لە دوای دروست بوونی نەتەوە یەکگرتوەکان بوە هەلمەتیکی یاسایی دژ بە ئیستعمار.

چۆنیەتی پیناس کردنی کیشەیەکی زۆری لەسەر نیە بۆیە لەزاراوەی دەولی نزیك ترە نەك چەمك، لە مەوسوعە سیاسیەکانی تر واهاتوە: (منح الشعب أو السكان المحليين إمكانية أن يقرروا شكل السلطة التي يريدونها وطريقة تحقيقها بشكل حر وبدون تدخل خارجي)، لە(الموسوعه العربيه)واهاتوە: (حق شعب ما في أن يختار شكل الحكم الذي يرغب العيش في ظلّه والسيادة التي يريد الانتماء إليها)، پیناسی نەتەوە یەکگرتوەکان کە بە (جارِنامەی 1970) واهاتوە: (لكل الشعوب الحق في أن تقرر دون

تدخل أجنبي، مركزها السياسي وأن تسعّى لتأمين نموها الاقتصادي والاجتماعي والثقافي)[766]، لەمادەی یەکی (عهدي حقوق الإنسان-1966) : (حرية الشعوب في تقرير مركزها السياسي وحرية تأمين نمائها الاقتصادي والاجتماعي والثقافي) ، ...

**پاساوی مافی چارەنوس:** سەرەڕای هێنانەدی ئاشتی پاساوی تری ئەخلاقی وسیاسی ویاسایی ونیشتمانی وتا شارستانی وفەرهەنگیشی هەیە ،ئەزمونەکان دەریان خستوە ئەو میلەتانەی بێدەولەتن وەك هێتیم وان ،لەوەوە (جوزيف شتراير) ووتویەتی (إن أفظع مصير يمكن معرفته في العالم الراهن، هو مصير من لا وطن له)[767] - واتە کارەساتی هەرە گەورە بۆهەر میلەتیك کە وولات ودەولەتی نەبێت .زیاتر لەوەش ئەو جۆرە میلەتە ناتوانێت خزمەنی زەمین بکات ،ناتوانی شارستانی بەرپا بکا ،ناتوانیێ لە چوارچێوەی هاریکاری میلەتان بێت ،بەلکو دەبێتە بارگرانی سەرمیلەتان و بە ڕاستی هێتیم بوونی بەتایبەتی ئەو میلەتانەی لە ژێر چەتری دەولەتیکی تری داگیرکاریە .

## سەربردەیەکی مافی چارەنوس:

دەسەلاتی سیاسی کلاسیکی لەپێش سەدەکانی 18 لە ئەوروپا و لە پێش سەدەی 20 لە رۆژهەلات کەمتر شێوازی نەتەوەیی بووە، زیاتر ئیمپراتۆریەتی بووە، سنورەکان وا باو نەبوو بەپێی رێکەوتنی نێودەولّەتی، بەلّکو بەند بووە بە هێزی ئیمبراتۆریەتەکەی بەشێوەیەك سنوری یاسایی و سیاسی بریتی بوو لەژێر پێی دوا سەربازی ئیمپراتۆر ، زیاتر لەوەش ئەو سەردەم کەمتر مەرجی ڕەگەزیی بنچینەیی تیابوو، هەتا چەمکی نەتەوە(قوم)و (نیشتمان)یش مانای ئەو چەمکەی ئێستای نەدەدا، بۆیە زۆر ئاسایی بوو کورد حوکمی عەرەب بکا، فارس حوکمی کورد و عەرەب بکا،.. یان بە پێچەوانە، هەر بۆیەش دەبینین ئەوانەی حوکمی (عەرەب)ی کردووە بریتی بووینە لە فارس و کورد و چەرکەس و

---

[766] ئەو پیناسە لەدەقی بڕیاڕی ( قرار الجمعية العامة رقم 2625 (د–25) الصادر في 24/تشرين الأول/1970) (المسمى فيما يلي "إعلان عام 1970").

[767] جوزيف شترایر- الأصول الوسيطة للدولة الحديثة، ترجمة: محمد عيتابي، ط1، دار التنـوع للطباعـة والنشـر، بـيروت-لبنـان، 1982، ص7.

مەمالیکی یۆنانی و ئەوروپی و جۆرجی..، بۆ ماوەی (8) سەدە بە دەگمەن عەرەبێك والی بەغدا نەبوو، تەنانەت داود پاشای والی بەغدا بەندەیەك بوو لە بازاڕی بەغدا چەند جار کڕین و فرۆشتنی پێ کراوە، ئینجا بووە والی بەغدا، دەولەتی(رۆستەمی) نزیکەی سەدەیەك حوکمی مەغریبیان کرد کە خۆیان عەجەم بوون ، بنەماڵەی گیان پۆلایەکان کورد (جنبلاتی ئێستا) لە لبنان و شام ماوەیەکی دور و درێژ حوکمیان کردوە، هەروەهاش دەسەلاتی عوسمانی ئاوا دروست بوو، لە ستەمی مەغۆل هەلاتن، کەچی دوای بوونە ئەو دەوڵەتە سنوری گەیشتە ئەوروپا و ولاتانی عەرەب، ئاواش دەوڵەتی ئەیوبی لە شام و میسر و کەنداو دروست بوو، ئەسکەندەری مەقدۆنی لە ڕۆژهەلات ...تاد، واتە ڕەهەندی نیشتمانی و نەتەوە بنچینە نەبووە لە دروست کردنی دەوڵەت، ، یان بە گوزارشیکی یاسایی پەیوەندیەکی سیاسی ویاسایی ڕوون لە نێوان نیشتمان(هەرێم) ونەتەوە(گەل) ودەسەلاتی سیاسی سەری هەلنەدابوو،بۆیە ئاسایی بوو دەسەلاتێك هەبێ لەسەر نیشتمانێکی تر وبەسەرۆکایەتی یەکێك کەلەڕەگەزی ئەوانیش نەبێ، لێرەوە دەتوانین بلێین مافی چارەی خۆنووس لەگەلّ دروست بونی مێژووی سیاسی نەتەوەکان دەست پێ دەکا، لەرووی یاساییەوە دەتوانین بلێین لەگەلّ سەرهەلّدانی پەیوەندی سیاسی و یاسایی نێوان هەرێم و گەل و دەسەلاتی سیاسی دەست پێ دەکا، بەشێوەیەك هەرێم بۆ نیشتیمان و گەل بووە نەتەوەودەسەلاتی سیاسیش بووە ئیرادەی نەتەوەی نیشتیمانیك بۆ خۆ بەڕێوەبردن ، سەرەتای ئەو پەیوەندیەش دەگەڕێتەوە بۆ ویستیڤالیا، زۆربەی بنەماکانی چەمك وزاراوە سیاسی ویاساییەکانی سەردەم(نەتەوەیی ،عەلمانیەت ، مافی مەدەنی .. )بۆ ویستیڤالیای1648 دەگێڕنەوە، تیایدا چواردەولەتی نیمچە نەتەوەیی سەری هەلدا بەدەر لە دەسەلاتی ئاینی ،یەکەمیان بریتانیا لە نیوان(1485-1589) لەسەر دەستی هنری حەوتەم،فرنسا لە نیوان(1461-1483) ،ئیسپانیا لەدەوروبەری 1469 و تاگەیشتە هۆلەندا [768] ،بەلام بە ئاماژەی ناڕاستەوخۆ بە مافی چارەنوس ودەولەت کردن زیاتر لە هەردوو شۆڕشی ئەمریکی1767 و وفرنسی 1769 هات،هەرچی ڕاستەوخۆ ناوی مافی چارەنوس لە کۆنگرەی ئومەمی لەندەن 1896دێت ودوای لە سالی 1918

---

[768] أ– موسوعة الأديان العالم، المشرف العام: جميل مدبك ط1 2000م–كتاب: الديانات القديمة –ص141 ب– ول ديورانت، قصةالحضارة .. ج3 ص530–

بوه بەشێك لە بنەمای شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیا بەسەرۆکایەتی لینین ، لە دوای سەرهەلدانی دۆزی نەتەوەیی مافی چارەنوسیش چەکەرەی کرد، سەبارەت بە سەرهەڵدانی مافی میلەتان بۆ دەولەت زیاتر دەگۆتریت یەکەم جار لەسەرەتای سەدەی 19هەندێ بیریاری ئەلمانی لەوانە(جۆهان هایدەر) باسی لە ڤۆلك کردو ووتی دەکرێ ئەو ناسنامە کۆمەلایەتیە(کەلەسەر یەکێتی خوێن دروست بوە ) گەشەی سیاسی وئیداریشی پێبدەی ,ئیتر هەر میلەتیك با خاوەنی دەولەتی خۆی (Nation-State) بێت ، چارەنوسی بەدەست خۆی بێت[769] ، لەدەوروبەری جەنگی جیهانی یەکەم بەتەواوی سەری هەڵدا، هەر لایەی میللەتانی ژێر دەستەی هان دەدا بۆ سەربەخۆیی تاگەیشتنە ئەو رادەیەی لێدوانی فەرمی بەریتانی و فرنسی لە 1918 دەرچێت، هەروەها چواردە بنەماکانی ودرۆ ویلسۆن لە 1918 دەرچوو، هەروەها لەبنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917 رووسیاش ئەو مافە پەیرەو کرا ، دوای لەمادەی(22)ی (عهد عصبە الامم) تارادەیەك وبەجۆرێکی ترمافی چارەنووسی لەشێوەی ئینتداب رەنگی دابۆوە بێئەوەی ناوی بێت،بەڵام لەمیساقی نەتەوەیەکگرتووەکان بە ئاشکراتر لە پەرەگرافی (2، 3) ی مادەی (1) و لەمادەی (55) هاتووە، بەلام ئەو کاتە زۆربەی وولاتانی جیهانی یەکەم ودوەم بە مافی چارەنوس شاد ببوون ،ئەوەی پێیان دەووترێ جیهانی سێیەم (زۆربەی گەلانی ئاسیاو ئەفریقا) ،لەدوای ڕووخانی عوسمانی ولەدوای جەنگی جیهانی یەکەم نۆرەی جیهانی ئیسلامی ورۆژهەلاتی ناوەڕاست دێت وەك جیهان کەوتە سەرەی دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بە پێی بنەمای مافی چارەنوس، بەو شێوەیە نەخشەی سیاسی نوێی جیهان دروست بوو، شەرعیەت درا بەهەر نەتەوەیەك کە خاوەنی هەرێم و نەتەوە و مێژوو و فەرهەنگی سەربەخۆ بێت وبەرگەی (مقەوماتی) دەوڵەتی هەبێت بەجۆرێك: لە (هەرێم)دا مقەوماتی جوگرافی و ئابوری هەبێ، لە(گەل)دا مقوماتی کۆمە لایەتی و گەشەی تێدابێت، لە(دەسەلات)ی سیاسیش مقوماتی سیاسی و یاسایی و بەرێوەبردنی تێدابێت، ئەوە بۆیان هەیە دەوڵەت دروست بکەن و بریارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەو مافە دەیانگرێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەو ریزبەندیەی دەولەتداری هەر لە خۆوە نەهاتوە ،لە بنچینەدا ریزبەندیەکی تر هەیە لەسەر بنچینەی ئاستی گەشەی پەیوەندی گەل بە خاکەوە ،چەند قۆناغ ودۆخێکی بەخۆوە بینیوە ، لەسەرەتادا پەیوەندی تاك وخاك هەبوە ،شێوەی زیدی باب وباپیرانی وەرگرتوە ، دوای بەرەبەرە

[769] Thomas D. Musgrave. Self Determination And National Minorities. Op. Cit. p. 5.

پەیوەندیەکە لەگەل خاك شێوەی بەکۆمەلی وەرگرتوە ، لێرە ناوی ئەو کۆمەلە لە ڕووی یاساییەوە دەبێتە گەل و خاکەکەش دەبێتە هەریم ، لە ڕووی سیاسیش ئەو کۆمەلە دەبنە نەتەوەو خاکەکەش دەبتە نیشتمان ، بی ئۆتۆماتیکی دەسەلاتێکی سیاسی ویاسایش دروست دەکا ،هەندی میلەت هەیە ئەو پەیوەندیەی قوول تروپێگەیشتوو ترە، ئەو کاتە زاراوەی ( فولك)ی بۆ دەگونجێ ، کەسەرباری پەیوەندی سیاسی ویاسایی نێوان میلەت وهەریم گوزارش لە پەیوەندی ئۆرگانیکیش دەکا نیوان هەندی میلەت وخاکەکەی ،وادەکات کە پەیوەندی سیاسی ویاسایی و (ئۆرگانیش)لە نیوان میلەت وخاك ودەسەلاتی سیاسی دروست ببیت(جاروایە دەگاتە رەگەزپەرستی)[770] ئەوە نزیکە لە **(حب الوطن من الایمان)** جیایە لەگەل بزوتنەوەی ونازی وفاشی وتۆرانی وبەعسی .. کە لەئەنجامی دەمارگیری ڕەچەلەکی دێت ،واتە خوێن دەبێتە چەق نەك خاك،...بەگشتیش پیچەوانەی ئەو میلەتانەی ئەو پەیوەندیەی گەشەی نەکردوە پێیان دەووترێ ئەیتیما.

**مافی چارەنوس و بەدەولەت بوون**:بەشی هەرە زۆر مافی چارەنوس و بەدەولەت بوون یەکسان دەکەن بەو ڕوانگەی کە هەمو میلەتیك خەون بەدەولەتی خۆی دەبینی ،ئەوەیان زیاتر ڕاستە لە ئەزمونی دەولەتە نەتەوەییەکان،لەئەزمونی دەولەتی نیشتمانی دەگۆڕێ، لەچەند ئەزمونیکی نوێ دەرکەوت ئەو بۆچوونە سەداسەد ڕاست نیە ،لە ریفرۆندامەکەی کیبیك و2000ز وسکۆتلەندا 2014 دەرکەوت هەندێ ژیانی هاوبەش لە چوارچیوەی دەولەتێکی نیشتمانی خۆشگوزەرانی لە جیابوونەوە چاکترە،بەو شێوەیە ئیستا مانای مافی چارەنوس ودەولەت بوون یەکسان نین ،ماناکەی ئەوەیە ئەو میلەتە چ جۆرەپەیوەندیەکی یاسایی وسیاسی وئابووری بۆچارەنوسی خۆی بە ئیرادەی خۆی هەلدە بژێری،هەر لە لامرکزی و ئۆتۆنۆمی تادەگاتە فیدرالی وکۆنفیدرالی ودەولەت دروست کردن دەگریتەوە ، ئەو شیوە بەدەولەت بوونە زیاتر بە مانای ڕێگەی یاسایی ناوزەد دەکریت ،زۆر شیوەی تریش هەیە بۆ هینانەدی مافی چارەنوس ،پیش جەنگی جیهانی ودوای ئەو جەنگە زۆر لیکجیایە :

---

[770] بۆ زیاتر لەبارەی زاراوەی فۆلك بڕوانە: الموسوعە الیهود والیهودیە والصهیونیە ج1 ص28

<u>پیش جەنگی جهانی یەکەم</u>: رۆسۆ ڕاستەوخۆ باسی بەدەولەت بوونی کردوەو پێی وایە زنجیرەیەك هەنگاوهەیە یەکەمیان لە نیشتمانیکی ئازاد دەکا ،ئینجامیلەتیکی یەکریز وبالا،میژوەکی هاوبەش،دەسەلاتی سیاسی،دەستور ..[771]،لەڕاستیدا یەك شیێوەی بەدەولەت بوون نیە زۆر ڕێگا هەیە هەتا کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆش نەبوویتە ئەو تەرازوە یاساییە ،بەلکو ئەوانەی خوارەوەش ڕێگای جیاجیان :

1- لەڕێی پەیامەکانی ئایینیوکاریگەریەکانی بەرجەستە دەبوو لە ڕاپەڕین و فتوحات و..

2- لەرێی گەشەی سروشتی مافی چارەنوس بە پرۆسەیەکی میژوویی،دەسەڵاتی بنەماڵە بۆ دەسەڵاتی خێڵ و هۆبەو بەرەو میرنشین و ئینجا دەوڵەت(ئیران- روسیا-تورکیا-...)

3- لە ریێی ریکەوتنامە نیو دەولەتی وئالوگۆڕی دانپیاهینان وەك ئەوەی لە ریکەوتنی ویستیڤالیا ڕوویدا (بریتانیا-فرنسا-هۆلەندا-ئیسپانیا)

4- لە ڕێی کۆتایی هاتن بە فۆرمی ئیمپراتۆری،زۆربەی وولاتانی جیهان لەو شێوەن هەرە دواییەکەی هەلوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ونەمساوی وئەلمانی لەجەنگی جیهانی یەکەم.

5- لەگەل هەندێ شێوەی تر ،ڕێسایەکیش هەیە دەگۆتری سەربردەی دوو دەولەت لەوجیهانە وەك یەك نیە ،بە واتایەکی تر هەر دەولەتەو ڕێڕەوێکی تیبەتی خۆی وەرگرتوە بەرەو دەولەت بوون جیایە لە یەکی تر ,

<u>دوای جەنگ</u> :

جاران خاکیکی پان وبەرین لەو جیهانە هەبوو بیدەسەلات وبیدەولەت ، زاراوەی ئەیتیما(atima) (ارض لاصاحب لها- res nnullius) وزۆرجۆرە زاراوەی تری بۆ داتاشرابوو ،هەرلەوەشەوە هەلمەتی ئیستعماری سەری هەلدا ،بەلام ئێستا هیچ بستە خاکێك نەماوە بێ سەروەری (سیادەی قانونی) ئەوا دەوڵەت چی تر بەو شێوانەی سەروو دروست نابێ، زۆر زەحمەت بووە، دەبێ بەشێوەی تر و

---

[771] رۆسۆ – فی عقد الاجتماعی ص159

ئامرازی تر بەکاربهێنیێ بۆ دروستکردنی دەوڵەت، لە هەمویان نویێ تر شێوەی یاساییەکەیەتی ، بەکورتی بەو شێوانەی خوارەوەی وەرگرتوە لەدوای جەنگ :

1-بە هۆی سیستەمی ئینتداب کە وولاتیك تەرخان دەکریت چەند میلەتیك فیرە دەولەتداری بکات نمونە عیراق و سوریاو ئوردەن و زۆری تر ،ئەوە لەسەردەمی (عوسبەتوئومەم)بوە (بۆزیاتر بابەتیکی تایبەتی لەو مەوسوعە هەیە –بڕوانە)

2-لەڕێی شۆڕش و ڕاپەڕین وبەرگری میلی خەباتی رزگاری کە لەسەردەمی نەتەوە یەکگرتوەکان بە فەرمی دانی پیا هێنرا کە لە پەرەگرافی (2)ی مادەی (1)ی (مقاصد امم المتحده) رەوایی پێ دراوە (إنماء العلاقات الودية بين الأمم على أساس احترام المبدأ الذي يقضي بالتسوية في الحقوق بين الشعوب وبأن يكون لكل منها تقرير مصيرها، وكذلك اتخاذ التدابير الأخرى الملائمة لتعزيز السلم العام). ئینجا بڕیاڕی ژ:1514 (خولی-15) 14 دیسمبر 1960،نمونەی جەزائرو ئەریتریا وووڵاتانی ئەفریقی و زۆری تر

3- موستەعمەرەو وسایا –ئەو بڕیاڕەی سەروو وچەندین بڕیاڕی تر هەیە بەپێی یاسای نێودەولەتی ئەو هەرێمانەی یاساییانە پیناسیان بە موستەعمەرە کراوە ئەوا مافی چارەنوسیان لای نەتەوە یەکگرتوەکان مسۆگەر کراوەو دەبنە دەولەت .

4-لەرێی پارچەپارچە بوونی دەوڵەتێکی پێکهاتوو لە یەکگرتنی فرەنیشتمان و فرەنەتەوە، هەلوەشاندنەوەی یەکیتی سۆڤیەت ودروست بوونی وولاتانی روسیاو کازاخستان و قرغیزیاو ئازەربیجان وئەرمینیاو..،هەروەها هەلوەشاندنەوەی یۆگوسلاڤیاو دوایش هەلوەشاندنەوەی چیکۆسلۆڤاکیا بۆ دوو دەولەت ، جاریش وایە بە پیچەوانە لە یەکگرتنی کۆمەلیك کیان دێتە دی وەك ئەلمانیا لە سالی 1871 و ئەمریکا بە جۆریکی تر و زۆر نمونەی تر .

4-یان بە خۆشیو بەرێکەوت لێك دەبنەوە ,لەو جۆرەدا دوو نمونەی نزیك هەیە یەکیان ئەزموونی هەرێمی (کیبك)ە کە لە 1998؟ بەخۆشی راپرسیەك ئەنجام درا دەرکەوت لە15٪دەنگیان بە مانەوەدا لەگەڵ کەنەدا , دووەمیان ئەزموونی چیکوسلوڤاکیا بوو , هەردوولا بەخۆشی لێك بونەوەو بۆ (چیك)و(سلوڤاکیا).

5-جاریش وایە لەشێوەی راپرسی پشت بە بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسی دەبەستریێ، یەکەم ئەزموون ئەو راپرسییە بوو کە لە ئانسلەندا لە 24/مایۆ/1944 ئەنجام دراو کۆمارێکی

سەربەخۆی لێ دروست بوو[772] ، جزائرو ئەریتریاو تەیمورو خواروی سودان و ئەزمونی نوێی دوای جەنگی سارد زیاتر بەو ڕێگایە ،بۆیە هەلوەستەی نەخشە ڕێگەیجێبەجێ کردنی دەوێ :

**ڕیفراندۆم(استفتاء)** : ڕاپرسی گشتی (یان لە کوردستان گشتپرسیشی پێ دەوترێت)،لە بنەچەدا ریفراندۆم زاراوەیەکی لاتینیە گوزارش لە دیموکراسی راستەوخۆی ئەسینی دەکا، ئەگینا بیجگە لەو پرۆسەیە دیموکراسی ڕاستەقینە بوونی نیە، هەر ناشگونجێت وەك رۆسۆ دەلی دیموکراسی ئەسینی جیبەجێ ناکرێ ...رۆبۆت دالیش دەلێ لەناو هەرکۆمەلیك ژمارەیان لە 10000زیاتر بیت ناکرێت ،مەحالە لە 50000 جیبەجی بکریت[773] ، رۆبیرت ماکیفریش دەلی ئەوەی راستیە ئەزمونی دیموکراسی یۆنانی حوکمی ئەرستۆکراسی بوو نەك دیموکراسی بەهۆی ئەوەی شمولی کۆمەلیك چینی نەدەکرد[774].

لەو سەردەمە زیاتر تایبەتە بە هەندی پرسی وا گرنگ کە لەسەرووی پەرلەمان بێت ،وەك لە زۆربەی دەستورەکانی وولاتانی دیموکراسی دیاری کراوە ،مادەی27ی دەستوری ئیتالیا،مادەی11ی دەستوری فرنسا[775]، هەروەها بۆ دەستورو بۆ مافی چارەنوس و بۆ زۆر پرسی چارەنوسساز پەنا بۆ ریفرۆندام دەبرێت ..

ڕیفراندۆم لەگەل مافی چارەنوس وچەمکی گەلان لە قاموسی نەتەوەیەکگرتوەکان پۆلین کراوە ، بەشیك زیاتر لەوە دەلێن پرسی مافی چارەنوس وبڕیاری 1514 بە ڕوونی دەریدەخا کە ریفراندۆم بۆ ئەو گەلانەن کە لەژێر دەستی ئیستعمارن ،بەلام دوای کۆنگرەی ڤیەنا ئەو پرسەی فراوان کرد هەمو جۆرە میلەتیکی ژێر چەپۆکی داگیرکاری دەگرێتەوە ،مەرج نیە هەمو داگیرکارێك هەر ئیستعمار بێت ، ریفراندۆم بۆ موستەعمەرە چەندین بڕیارِی نێودەولەتی لەسەرە،لێلّی تێدانیە ،ئەوەی کێشەی لەسەرە بۆ ئەو میلەتانەی لەناو یەك دەولەتن وناکۆکن ، میلەتیکیان کەمایەتی ترە مافی چارەنوسی دەوێت

---

[772] بروانة: علاقات السياسية الدولية والمشكلات الكبرى ص30.

[773] موسوعه علم الاجتماع -مادة : ديمقراطية

[774] رۆبیرت ماکیفر-تكوين الدوله ص221 .

[775] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ص196

یان یاساییانه تر بیلێین مافی جیابوونەوەیان دەوێت ،لە موستەعمەرەکان مافی چارەنوسی بۆ دەبێت لەوەی تر مافی جیابوونەوە (حق الانفصال)،کەچی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان وەك موستەعمەرەکان نیە بەو ئاسانیە ،پیویستی بەمەرجیکی قوڕس هەیە ئەویش رازی بوونی دەولەتی خاوەن میلەتەکەیە کەزۆربە زەحمەت ئەو رەزامەندیە بەدەست دێت ، بۆیە لەکوردستان وەك نمونە ماوەیەکی دریژ (لە دەوروبەری سالانی 2010بەدواوە ) باسێکی زۆری ڕیفرۆندام کرا واتێگەیشتبوون ئەگەر بەیەکلایەنەناش بکرێت بێڕەزامەندی دەولەت شەرعیەت وەردەگرێ ،کەچی هەلەیە ، عادەتەن لەو جۆرە دەولەتانە لە دەستور داکۆکی توند لەسەر پرسی یەکپارچەیی خاکیان دەکرێتەوە ، بەلام هەندێ وولاتی دیموکراسی بالآ ،خاوەن شکۆی دەولی هەیە لەدەستور یان لە نەریتی دەستوریان ڕەزامەندیان هەیە بە ریفرۆندام میلەتیك جیا بیتەوە وەك بینیمان لە کەنەدا کراو لە بریتانیاش بەلام بۆ کەتەلۆنیای ئیسپانیا ئەو رەزامەندیە بەو ئاستە نەبوو لەلایەن دەولەتی ئیسپانیا ، نمونەیەکی نزیك کوردستانمان هەیە لە نێوان سربیاو کۆسۆڤا ،چونکە ریفرۆندامەکەی کۆسۆڤا بە ڕێکەوتن نەبوو لەگەل سربیا ، سربیا رەزامەندی لەسەر ئەنجامی ریفرۆندامەکە دەرنەبڕی بۆیەش نەتەوە یەکگرتوەکانیش پشتی نەگرتن ، ناچار ئەو پشتیوانیە دەولیە تەنها توانی لە دادگای لاهای(محکمە العدل الدولیە) لە 2010/7/22 یەکلا بکرێتەوە ، هەنگاوە یاساییەکان بەو شێوەیە بوو :

نص قرار الجمعية بهذا الشأن: الجمعية العامة –د:64 بند:77 8سبتمبر2010

واذ تشير الى قرار(جمعية العامة) ٦٣/٣ المؤرخ ٨ / تشرين الأول أكتوبر ٢٠٠٨، الذي طلبت فيه محكمة العدل الدولية إصدار فتوى بشأن السؤال التالي: "هل يُعد إعلان مؤسسات الحكم الذاتي المؤقت في كوسوفو الاستقلال من جانب واحد موافقا للقانون الدولي ؟ 1/Rev.65/L.64A/

جواب المحكمة : .. أعلن (هيساشي اوادا) رئيس محكمة العدل الدولية في قصر السلام في لاهاي إن المحكمة "خلصت إلى أن إعلان الاستقلال في 17 شباط/فبراير 2008 لم ينتهك القانون الدولي العام." وصوت لصالح القرار 10 قضاة وفي حين اعترض عليه أربعة.

وأقرت الجمعية العامة بمضمون الفتوى التي أصدرتهامحكمةالعدل الدولية بشأن توافق إعلان استقلال كوسوفومن جانب واحدمع القانون الدولياستجابةلطلب الجمعيةالعامة في دورتها (64) يوم 8سبتمبر 2010 ..

ئەزمونەکانی ریفراندۆمی جەزائیرو ئەریتریاو تەیمورو خواروی سودان بەرێکەوتن بوە یەکلایەنانە نەبوە

بریاری ژ:1590 مادە 4 لەنەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆ ریفراندۆمی خواروی سودان ،بە رەزامەندی سودان ،ئەگەر رەزامەندی دەولەتەکە یان نەتەوە یەکگرتوەکان نەبێت ئەو ریفرۆندامە رەوتی یاسایی وەرناگری، ئەوەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە کورد تا ئێستا زیاتر رێگەی شۆرش و بەرگری بەکار هێناوە ،ئومێدێکی زۆری بە نەتەوە یەکگرتوەکان نەبوە ، بەڵام هەندێ دەرگای تر کراوەتەوە ,هەڵبەتە لە کۆنەوە تەقەڵایێ دراوە لەلایەن دەسەلات دارانەو شۆرش و بەرگری بە شەرعی حساب نەکرێ توومەتی وەك (تحزيب, إرهاب, تمرد...ألخ) لە بنەچەدا ئەو رەواییەی بەرگری ژێر دەستان لەلایەن ئاینییەوە پێدراوە (اذن للذين يقاتلون بانهم ظلموا...) لەسەردەمی نوێش لە(پروتوکولی ترویاو)لە 1819 رێ درا تەنها بۆ پاشاو سەرۆکانەی خۆبەخۆ دەسەڵات بگۆرن بەڵام بۆ بەرگری میللی رەت کرایەوە ,دوای ئەوە ئینجا ناوە ناوە بنەمای مافی چارەنوس هاتە گۆرێ بەدوو رویی تا ئەو ساتەش, لەلایەك بەیاسایی ئەو مافە دەکەن لەلایەکی تریشەوە بە پێچەوانە..بۆیە پێویستە شان بەشانی چەکداری چەکی یاسایی و شەرعی بەهێزیش ئامادەبکەی بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی ، بەکورتی لەو دەمە رێیە یاساییە نێودەولەتیەکان لە پیش هەریمی کوردستان سەبارەت بە مافی چارەنوس(یان مافی جیابوونەوە ) ئەوانەیە:

1-رێپیدانی نەتەوە یەکگرتوەکان ..ئەوەش ئەو کاتە نزیك تر بوو کە عیراق لە بەندی 7 بوو .

2- رێکەوتنی کوردستانی وعیراقی

3-ئەگەر عیراق خۆی دابەش بوو .

4-ئەگەر ناوچەکە کەوتە بۆشاییەکی یاسای دەولی ئەو کاتە ریفرۆندام رەوایی وەردەگری ..جاریش وایە لەو بۆشاییە وەسیقەی ئیستقلالی دەوێت کەلەلایەن کۆمەلیك کەسایەتی بنچینەیی وولاتەکە داوا دەکرێت .

مەرج نیە هەر ریفرۆندامت کرد یان جارِی دەولەتت دا ئەوا ببی بەدەولەت وئەندام لەنەتەوە یەکگرتوەکان ،فەلەستین لە 15ی سپتمبری 1988 ەوە جارِی دەولەتی داوە کەچی تا ئیستا هەر جارِدانە ،تایوانیش تا ئەوساتە 15 جار داوای بوون بەئەندامی کردوە لەنەتەوە یەکگرتوەکان

وەرنەگیراوە[776] . هتر بۆزانینیش لەمادەی 64ی سیڤەر ڕەهەندی ریفرۆندامی تێدا بوو ،بەلام بە ئاڕستەیەکی تر بردرا.

ریشەی یاسایی مافی چارەنوس

ئەوەش لە دوو بەشی سەرەکی دێت ،یەکەمیان بنەماکانی مافی چارەنوسە ،کە لە پـیش جـەنگی جیهانی یەکەم ودروست بوونی عوسبەت ئومەم و نەتەوە یەکگرتوەکان هاتوون ، بیجگە لـە بنـەمای شۆڕشی ئۆکتۆبەر مەرج نیە ناوی مافی چارەنوسیان هێنا بێت بەلام دەبێتە بنەمایەك بۆی ،دوەمیان بریتین لەو بڕیارو عەهد میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان هاتون بەڕاشکاوانە بە ناوی مافی چـارەنوس ، هەندیك وای بۆ دەچن یەکەمیان سیاسیەو دوەمیان یاساییە .

یەکەم - بنەماکانی مافی چارەنوس:

ئەو بنەمایانەی لە شۆڕشی ئەمریکا هات ،دوای بوە دوو مادەی بەلگەنامەی سەربەخۆیی ئەمریکا، جاریش وایە( وەسیقەی جیفرسۆن)یشی پێدەووترێ وبریتین لە : - إعلان استقلال امريكا 4 يوليو عام 1776م: نحن نعتبر هذه الحقائق بديهية:1- إن الناس جميعًا خلقوا متساوين، وإن خالقهم حباهم بحقوق لايجوز الافتئات عليها، وإن من هذه الحقوق حق الحياة، والحرية، والسعي وراء السعادة. 2- ,وإنّه تأمينًا لهذه الحقوق، فقد أُنشأت الحكومات مستمدة سلطاتها العادلة من موافقة المحكومين٠.

ب - ئەو بەمایانەی لە شۆڕشی فرنسی 1789ز هاتوە ، لە شێوەی جاڕنامـەی مـافی مـرۆڤ وهاوولاتی هاتوە پیکهاتوە لە 17 مـادە ،لەلایـەن ئەنجومـەنی کـاتی فرنسـی دەرچـوە لـە 26/ئۆگست/1789، ئەو ئاماژانەی هاتون وەك خۆی بلاوی دەکەینەوە :

"إن ممثلي الشعب الفرنسي، الملتئمين في جمعية وطنية، إذ يؤكدون أن الجهل والإهمال وعدم احترام حقوق الإنسان هي وحدها أسباب شقاء المجتمع وفساد الحكومات، يعلنون أنه قد قر عزمهم على أن يعرضوا في إعلان للعموم حقوق الإنسان الطبيعية، المقدسة، غير القابلة للخلع، وذلك لكي يبقى هذا الإعلان حاضرا باستمرار في جميع أعضاء الجسم الاجتماعي يذكر الناس على الدوام بحقوقهم وواجباتهم، ولكي تكون أعمال السلطات التشريعية

[776] لەبارەی وەرنەگیرانی بڕوانە: الملف القانونی لحق تقرير المصير لشعب كوردستان وفق قوانين الدوليه ص128

**وتصرفات السلطات التنفيذية قابلة لأن توزن في كل لحظة بالهدف من كل مؤسسة سياسية فتحظى بذلك باحترام أكبر، ولكي تكون احتجاجات المواطنين التي ستنبني من الآن فصاعدا على مبادئ بسيطة وغير قابلة للاعتراض عليها، لأنها ستدور دوما حول العمل بالدستور ومن أجل سعادة الجميع. وبناء عليه فإن الجمعية الوطنية تقرر وتعلن، أمام الكائن الأسمى وتحت رعايته، حقوق الإنسان والمواطن الآتي ذكرها".**

**المادة الاولى :يولد الناس ويعيشون أحراراً متساوين قي الحقوق. ولا يمتاز بعضهم عن بعض إلا فيما يختص بالمصلحة العمومية (أي أن نفع الجمهور هو قاعدة الامتياز).**
**المادة الثانية : غرض كل اجتماع سياسي حفظ الحقوق الطبيعة التي للإنسان والتي لا يجوز مسها. وهذه الحقوق هي: حق الملك وحق الأمن وحق مقاومة الظلم والاستبداد.**

ج- ئەو بنەمایانەی لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 هاتوە کە بە ( قرار المؤتمر الأممي المنعقد في لندن عام 1896) ، ئەو بنەمایە لە سالی 1896ی کۆنگرەی ئومەمی لەندەن هاتوە بەلام لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەر بەسەرۆکایەتی لینین ئینجا بەرجەستە بووو ،دەقەکەی ( يعلن المؤتمر تأييده لحق جميع الأمم التام في حرية تقرير مصيرها ويعرب عن عطفه على عمال كل قطر يقاسي آنيا نير الاستبداد العسكري أو القومي أو غيرهما، ويدعو المؤتمر عمال جميع هذه الأقطار إلى الانضمام إلى صفوف العمال الواعين أي الواعين لمصالح طبقتهم في العالم أجمع، للنضال معهم في سبيل التغلب على الرأسمالية العالمية وتحقيق أهداف الاشتراكية الديموقراطية الأممية).

**وتبنى (لينين) هذا القرار : "بما أن هذا الحق قد أخذ به بصورة ميكانيكية نقلا عن قرار مؤتمرالحزب الاول (1898)، الذي أخذه بدوره عن مقررات المؤتمرات الاشتراكية الأممية، وهو .. تقرير المصير السياسي، أي تقرير مصير الأمم باتجاه الاستقلالالسياسي. وعليه فان صيغة تقرير المصير القومي، التي تعني حق الانفراد بالكياناالجغرافي،..**
**إن حق تقرير المصير، من وجهة نظر الماركسية عموما، لا يثير أية صعوبة. فليس ما يدعو جديا إلى الاعتراض على قرار لندن الصادر في عام 1896 ولا إلى فهم حرية تقرير المصير بمعني آخر غير معني حق الانفصال.**

خ– هەندی بنەمای تر هەیە لە کۆنگرەی برلینی سالی 1878 ، جامیعەی ئیسلامی کەلەلایەن ئەنجومەنێکی بالآی خەلافەت لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم جارِ درا. هەروەها کۆنگرەی پاریسی 1902/2/4.

د– بنەماکانی مافی چارەنوس لە 14 خالەکەی ویلسن لە سالّی 1918 .

ژ– لێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی - فرنسی لە 1918،...تا دەگاتە کۆنگرەکانی سان ریمۆ وسیڤەر لە 1920.

ئەو بنەمایانە کەمتر بوە هۆی شاد بوونی میلەتان بە مافی چارەنوس بەلکو بە پیچەوانە بەو ناوە زیاتر هەلمەتی سەربازی کرا ،هەلمەتەکانی ناپلیۆنی فرنسی ، پەلئاویشتنی ئەمریکا بۆ ویلایەتەکانی دەوروبەر ئینجا بۆ جیهان ، لیدوانەکانی فرنسی وبریتانیش بوە سیستەمی ئینتداب نەك مافی چارەنوس ،تەنها شیوعیەکان شانازی بە پیادەکردنی ئەو بنەمایانە دەکەن لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر ، **نمونەی** بەسەربەخۆیی فنلندا دەهێننەوە لە چوارچیوەی بنەمای مافی چارەنوسی (ئۆکتۆبەر) ، کەچی بەشیکی تر دەلین ئەوە لە ئەنجامی ئەو بنەمایە نەبوە ،بەلکو لە چوارچیوەی ریکەوتنی ئەلمانی وروسی بوە لە7/نۆفمبەری 1918بە ناوی (برنستلیتۆفسك) تیایدا دان نرا بە ئۆکراینا وفنلندا[777].

.

دوەم —بەلگەنامە نێو دەولەتیەکان

ئەوانەن کە لە کۆنگرەو ڕێکەوتنامە نێودەولەتیەکان هاتوون ،ئەو وولاتانە مۆریان کردوە کە بە وولاتی بنچینەی جیهان هەژماردەکرێن ودوای نەتەوە یەکگرتوەکان بە جۆریك ڕەهەندی یاسایی پیێداوە بە داکۆکی کردن یان تەبەنی کردن ، بەکورتی ئەوانەن :

کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆی 1933:ئەو کۆنگرەیە لە 26/کانونی یەکەمی/1933مۆرکرا پێکهاتبوو لە16 مادە،تیایدا پێوەرێك دیاری کرا بۆ مافی چارەنوس و دوایش بوە پێوەری بە دەولەت بوونیش وەك بەشێك لە یاسای دەولی ، 3 پایەی بنچینەی دەولەت دیاری کرا کە بریتین لە (گەل-هەریم-دەسەلاتی سیاسی) کە لە مادەی یەکەمی هاتوە ،ئەوە دەقەکەیەتی بە ئینگلیزی :

ARTICLE 1

The state as a person of international law should possess the following qualifications: a ) a permanent population; b ) a defined territory; c ) government; and d) capacity to enter into relations with the other states.

ARTICLE 2

---

[777] دریژەی ئەو ریکەوتنە لە:( الموسوعة الميسرة للمصطلحات ..ص75)بخوینەوە

The federal state shall constitute a sole person in the eyes of international law.
........

وەرگێرانەکەی بەکوردی ( هەمو وولاتێك یەکسانن لە سەروەری، دەولەت پیکدێت ئەگەر (گەل وهەریم) ودەسەلاتیکی سیاسیتیا بەرجەستە بێت بتوانێ ریکەوتن لەگەل وولاتانی تر بکات .

میساقی ئەتلەسی 1941 کە لەنێوان رۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکاو چەرچلی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا مۆرکرا ،ئەوە دەقەکەیەتی : (يعلن رئيس الولايات المتحدة الأمريكية (روزفلت) ورئيس الوزراء البريطاني (تشرتشل ) المبادئ المشتركة في السياسات الوطنية لبلديهما، ويبنيان آمالاً عريضة لمستقبل أفضل للعالم.

أولاً: إن حكومتي البلدين لا تسعيان إلى تحقيق توسّع إقليمي أو غيره.

ثانيًا: ليست لديهما الرغبة في رؤية أيّ تغييرات لا تنسجم مع رغبات الشّعوب التي يهمها الأمر.

ثالثًا: إنهما يحترمان كُلّ الشعوب في اختيار نوع الحكومة التي تعيش تحت حكمها ويودّان رؤية حقوق الملكية والحكم الذّاتي عند أولئك الذين حُرموا منها.

رابعًا: سيبذلان جهدهما مع مراعاة الالتزامات الراهنة لتحقيق السعادة لجميع الدول صغيرة كانت أم كبيرة، مهزومة كانت أم منتصرة. وتكون لها حقوق متساوية في التجارة وفي الخامات الأولية التي تحتاج إليها لازدهارها الاقتصادي.

خامسًا: يودّان أن يدعما التعاون والتآزر لأقصى حدٍّ ممكن بين كل الأمم في المجال الاقتصادي، مع مراعاة ضمان الأمن للجميع، وتحسين مستويات العمالة والتقدم الاقتصادي والأمن الاجتماعي.

سادسًا: بعد التحطيم النّهائي للنازية، يأمل الجانبان تأسيس سلام، يُحقِق لجميع الدول وسائل التنقل في أمن وسلام داخل حدودها، وتأمين حياة كل الشعوب على أراضيها بعيدًا عن الخوف والحاجة.

سابعًا: يجب أن يحقِق هذا السلام التنقّل عبر البحار والمحيطات دون أي عقبات.

ثامنًا: يؤمن الجانبان بأن كل الأمم يجب أن تتّفق على عدم استخدام القوة لأسباب واقعية وروحية. ولأنّه لا يمكن تحقيق سلام في المستقبل، إذا ما كانت الأسلحة البرية والبحرية والجوية لا تزال مستعملة من قبل الدول التي تُهدّد ـ أو قد تهدد ـ بالتعدي خارج حدودها. ويؤمنان بناء على تأسيس نظام عام ودائم للأمن أن نزع السلاح من مثل هذه الدول أمر ضروري. وسيقوم الطرفان بمساعدة وتشجيع كل الإجراءات التي يمكن تطبيقها، والتي يمكن أن تُسهم مع الشعوب المحبّة للسلام في إبعاد شبح الأسلحة.)

ج– جاڕنامەی هلسنكی 1975/7/21 ئەویش بە ڕوونی ئاماژەی بە مافی چارەنوس كردوە ،مافی كەمایەتیشی باس كردوە ،دیاریشی كردوە ئەو مافەچارەنوسەی دەگونجێ لەگەل میساقی نەتەوە یەكگرتوەكان و مەبەستەكانی .

د- هەردوو عەهدی تایبەت بە (الحقوق المدنیە و السیاسیە) و(الحقوق الاقتصادیە والاجتماعیە والپقافیە )كە لە لای نەتەوە یەكگرتوەكان دەرچوە لە 1966/12/16 ، لە مادەی 1 و2 ئەو مافە هاتوە ،

هـ- جاڕنامەی ڤیەنای 1993/6/25 بەناوی (المؤتمر الدولی لحقوق الإنسان)بوو بەلام لەو كۆنگرەیە ئەو كیشەیەشی چارەسەر كرد ئاخۆ مافی چارەنوس بە پێی پێوەرە دەولیەكان وفەرهەنگی نەتەوە یەكگرتوەكان هەر موستەعمەرە دەگرێتەوە یان هەمو میلەتانێك ،لیرە ڕوون كرایەوە كە هەردوو بەشی موستەعمەرەو ناموستەعمەرە دەگرێتەوە ،هەمو جۆرە داگیركاریەكی ڕەت كردەوە كە دەقەكەی لە پەرەگرافی دووی مادەی یەك واهاتوە : لجمیع الشعوب الحق في تقریر المصیر. وهي، بمقتضى هذا الحق، تحدد مركزها السیاسي بحریة وتسعي بحریة إلي تحقیق تنمیتها الاقتصادیة والاجتماعیةوالثقافیة.

وإن المؤتمر العالمي لحقوق الإنسان، إذ یأخذ في اعتباره الحالة الخاصة للشعوب الخاضعة للسیطرة الاستعماریة أو غیر ذلك من أشكال السیطرة الأجنبیة أو الاحتلال الأجنبي، یسلم بحق الشعوب في اتخاذ أي إجراء مشروع، وفقا لمیثاق الأمم المتحدة، لإعمال حقها، الذي لا یقبل التصرف، في تقریر المصیر. ویعتبر المؤتمر العالمي لحقوق الإنسان إنكار الحق في تقریر المصیر انتهاكا لحقوق الإنسان ویؤكد أهمیة الإعمال الفعلي لهذا الحق.

چوارەم–یاساكانی نێودەولەتی سەبارەت بە مافی چارەنوس

لەدوای دروست بوونی دام ودەزگای نێو دەولی دان پیا هێنراو ئەوا ئەو میساق وبڕیاڕانە پالپشتی یاسایی نێو دەولەتین بۆ مافی چارەنوس بەكورتی:

1- میساقی نەتەەوە یەککگرتوەکان کە پیکهاتوە لە19بەش و 111 مادە، ماددەی (1)ی بەشی یەکەمی میساقی نەتەوە یەککگرتوەکان مەبەستەکانی ئەو میساقەو خودی نەتەوە یەککگرتوەکان ڕوون دەکاتەوە کە بۆ مافی چارەنوس و پاراستنی ئاشتی دەولی هاتوە ،دوای جاریکی تر لە ماددەی (55)ی هەمان میساقهاتۆتەوە سەر مافی چارەنوس .

3- ئەو بڕیارانەی کە لە نەتەوە یەکگرتوەان دەرچوە سەبارەت بە مافی چارەنوس:

بڕیارەکانی ژ:1514ی خولی(15)ی 14/دیسمبر/، 1960، بڕیاڕی ژ: 2105 خولی (20)ی دیسمبری 1965، بڕیاڕی ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 شەرعیەتی بەرگریشی پێدا، بڕیاڕی ژ: 3070خولی(28)ی نوڤمبری 1973 ... مادەکانی(58-60)ی (فصل العاشر-قبول أعضاء جدد) .

ئەو گەلانەی مافی چارەنوس نایان گرێتەوە :

تا پیش کۆنگرەی ڤیەنا تەواو ساغ نەبۆوە ئاخۆ ئەو میلەتانەی لە ژێر داگیرکارین بەلام داگیرکەرەکە ئیستعمارنیە بڕیاڕو بنەما دەولیەکان مافی چارەنوس بەوانە ڕەوا دەبینن ، ئیستا لە ژێر سایەی تاك جەمسەری زیاتر ساغ بوویەوە بەتایبەتی لەدوای ئەزمونی میلەتانی تەیمورو خوارووی سودان وکۆسۆڤا ،هەروەها ئەو فتوایەی دادگای لاهای سەبارەت بە سەربەخۆیی کۆسۆڤا ، زیاتر ئەوانە زاراوەی یاسایی(حق الانفصال- remedial sesion) مافی جیابوونەوەیان بۆ دیاری کراوە نەك مافی چارەنوس ، لەوەش بۆ هەمو میلەتێك نیە بۆهەمو جۆرە دەولەتێك نیە ، داواکردنی یاسایی مافی چارەنووس هەروا بە بڕیار و ڕێکەوتن نیە، بنچینەیەکی یاسایی هەیە، ئەگەر لە ولاتەکە کەمایەتیەك بیت ئەوا تا ئاستی (مافی هاولاتی بوونی دەستوریانە) مافت هەیە داوابکەی، ئەگەر لە کەمایەتیەکە زیاتر بووی بەلام هەرێمێکی فەرمیت بەناو نەبوو یاخود لە بوارەکانی ئابوری و سیاسی و ئیداری (متکامل) نەبێ ئەوا تا ئاستی ئۆتۆنۆمی (ناوەکی) مافت هەیە داوا بکەی، بەپێی کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆ ئەگەر هەرێمی سەربەخۆت هەبوو ناسنامەش بەناوی میللەتەکەت بوو ئەوا بڕگەی (2)ی ماددەی (1)ی (میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان) دەیگرێتەوەو مافی چارەنووست پێ

رەوا دەبینرێ لەرووی یاساییەوە، بە پێچەوانە ئەگەر رێ لەوە بگیرێ بەداگیرکەر هەژمار دەکرێن وەك لەبڕیاڕی ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 هاتوە، ئەگەر لە وولاتیکی فرە نەتەوەو پیکهاتە دیسان دەولەت بە یەکسانی کاری بۆهاولاتیان نەکرد ومافی مرۆڤ تیایدا بەردەوام پیشیل کرا ئەوا ئەوجۆرە میلەتەی خاوەن هەریم مافی جیابوونەوەی دەبێت .

ئەو مافە یاساییانە لە (UN) و لە (مقاصدەکان وپرانسیپەکانی نەتەوەکان) دیاری کراوە، تیایدا هاتووە هەر نەتەوەیەك دەتوانێ چارەنووسی سیاسی و ئابووری تەواوی خۆی دیاری بکا، لەهەردوو مادەی (1) و (55) ی (میثاق الأمم المتحدة) هاتووە، زۆر جاری تریش دوو بارە کرایتەوە و مافی بەرگری چەکداریشی داوە بە پێی مادەی(1) پەرەگراف (2)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان وا هاتووە : ( إنما العلاقات الودية بين الأمم على أساس المبدأ الذي يقض بالمساواة في الحقوق بين الشعوب و بأن يكون لكل منها تقرير مصيرها )، هەروەهامادەی(55) چەند جاریتر لە بریارەکانی (UN) دووپات کراوەتەوە، لە سالّی 1960 جارێکی تر بڕیارێکی تری ( مافی چارەنووسی ) درا بە ژمارە 1514 خولی(15)بەسەردێری : (إعلان منح الأستقلال للبلدان والشعوب المستعمرة) تیایدا هاتوە : (إن الجمعية العامة .. تعلن .. لجميع الشعوب حق في تقرير مصيرها، ولها بمقتضى هذا الحق أن تحدد بحرية مركزها السياسي، وتسعى بحرية الى تحقيق نمائها الأقتصادي والاجتماعى والثقافي).

لە بنەچەدا بەو پاساوە یاساییانە ئەو مافەی چارەنووس هاتووە :1- پاراستنی ئاشتی2- قەلاّچۆی چەوساندنەوە 3-پێکەوە نەژیانی چەند پێکهاتەیەك پێکەوە 4-مافی مێژوویيان لە سەر خاکی خۆیان 5-نەبوونی ڕاپرسی کەپیشانی بدا بە پێکەوە ژیان قایلن 6-یان پێ شێل کردنی ڕێکەوتنێکی نێوانیان ,..

هەروەها ئەو مافە هەر میللەتێك دەگرتەوە بەپێی ی ئەو مەرجانەی کە لە نەتەوە یەکگرتووەکان هاتووە :1-مقەوەماتی یەك نەتەوەییان هەبێ وەك هاوبەشی زمان و خاك ومێژووو..2-لە نێوان ئەو گەلە پەیوەست وئیرادەی سیاسی هەبیت 3-لە نێوان هەموو ئەوانەو هەرێمەکەیان پەیوەستی سیاسی بە کۆمەل هەبێ .

کەواتە مافی چارەی خۆنووس کەمایەتی ناگرێتەوە،بۆیە لە نەتەوە یەکگرتووەکان پەرەگرافی(ج)لەمادەی(55) بۆ مافی فەرهەنگیان دیاری کلراوە .

لیژنەیەکی تایبەتیش لە نەتەوە یەکگرتوەکان هەیە بۆ دیاری کردنی مافی چارەنوس ، ئەو لیژنەیە لەسالی 1961 لە خولی 16 دەست نیشان کرا ، پیکهاتوە لە 17 ئەندامی وولاتە جۆربەجۆرەکان ،ئەندامانی ئیستایان : روسیا-ئەسیبیا-ئەندۆنیسیا-ئیران-غینیای نوی-پۆلیڤیا-تۆنس-تەیمور-تانزانیا-سوریا ..

<u>مافی چارەنوسی کوردستان (تایبەت) :</u>

ئەوەی سەروو مافی چارەنووس بەگشتی بوو ئیستا دەردەکەوێ کوردستانی بەسانایی دەگرتەوە، هەرچی ڕەگی تایبەتی مافی چارەنوسی کوردستان دیسان قوولّەو بنەمای یاسایی خۆی هەیە، هەندێکی لیێ باس دەکەین :

1- دەسەلاّتی سیاسی کورد لەمێژووی کوردستان، کە هەندێکیان لەئاستی دەوڵەت بوونەو سکە و ئالاّی تایبەتی خۆی هەبوە، جگە لە دەسەلاّتە مەزنەکەی ئەیوبیش..

2-ریکەوتنامەی دەولی هەبوە ، رێککەوتنی کابانی کـوردی و پێغەمبـەر (د.خ)، هاوپـەیمانی (دێلم)ی کورد وسەعد لە شەڕی قادسیە، لە هەمویان گرنگتر رێکەوتنی سولّتان سەلیم لەگەلّ (23) ئیمارەتە کوردیەکە بە سەرپەرشتی (شێخ ئیدریسی بەدلیسی-لە 1514).. ڕەنگە یەکەم ڕێکەوتنی نێودەولّەتی بیێ لەنێوان دەسەلاّتی سیاسی کورد پایەیەکی یاسایی بەهێزی هەیە ،چونکە پێك هاتبوو لە خالّی دیاریکراو و بەلّگەنامەو پابەندی هەردوولا نەك ملکەچی لایـەك بـۆ بڕیـار و رێکەوتنانـە، بەلّکو هەردوو لا بۆی، دەقی خالّەکانیش بریتی بوون لە:

1- سەربەخۆیی ئیمارەتەکان .

2- سولّتان دانی پیا بهێنیێ و بە میراتی دەسەلاّتیشیان.

3،4- هەردوو لا یارمەتی یەکتر بدەن لە کاتی هێرشی دەرەکی.[778]

---

[778] بۆ زیاتر بڕوانە (الكورد والكردستان في الوثائق البريطانية)- ص16-17.

خاڵی چوارەم نرخێکی یاسایی بەهێز و گرنگی هەیە، وە پێك هاتووە لـە (دفـاع المشـترك)، واتـە شەخسیەتی یاسایی بۆ حسـاب کـراوەو پابەنـدی و بەرپرسـیاریەتی یاسـایی خراوەتـە ئەسـتۆ و لـە بەرامبەریشدا لایەنی تریش بە هەمان شێوە، لە دوای ئـەو رێکەوتنـە بـووە هـۆی دەرگـا کرانـەوەو داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبی، تا هێزەکانی عوسمانی گەیشـتە میسـر، ئـەوکاتی خەلیفـەی عەباسـی (متەوەکیل) لەوێ بوو، بەیعەتی داو شەریفی مەککەش (ئەو ئەمانەتانەی پێغەمبەری) دا بە سوڵتان سەلیم، ئیتر دەوڵەتی عوسمانلی لـە سـەڵتەنەتەوە وەرچـەرخا بـۆ خەلافـەت و پـەیڕەوی لامرکـزی و سیستەمی ویلایەتی کرد، بەڵام کوردستان پایەی لە سیستەمی ویلایەت زۆر بـەرزتر بـوو، بـە زۆری خاوەنی دەوڵەتی خۆی بووە، دەوڵەت نەك ئیمارەت چونکە خاوەنی سوپاو سنور و شەخسیەتی یاسایی و سکە و ئاڵا... هەتا لە دوعای هەینی بۆ سەرۆکەکانی کورد خۆیان بووە نەك بۆ خەلیفـە، ئـەوەش مانای یاسای و ئایینی بەخشینی سەربەخۆی تەواو بووە .

ئەو ریکەوتنە زیاتر لە 150 سالی خایاند ، دوای جاریکی تر ە رێکەوتنی سوڵتان محەمەد رەشاد و دواییش محەمەد واحیدەدین و نوێنەری کورد بۆ مافی چارەنووس لە 1914-1921 .

3- لایەنە یاساییەکانی کۆنگرەکانی سیڤەر 1920، کۆنگرەی قاهیرەی1921و لائیحەی ئینتدابی بەریتانیای1920 بەسەر عێراق.

4- مافی چارەنوسی کورد لە کۆنگرە نێودەولەتیەکان بەتایبەتی ولە ژێر سەردێری کوردستان بوە ، عیراق وکوردستان بە مادەی جیا مافی چارەنوسیان بۆ دیاری کرا ،عیراق بەمادەی 94 وکوردستانیش بە مادەی (63).

4- دان پیاهێنانی دەوڵەتی عوسمانلی بۆ دەسەڵاتی شێخ مەحمود ،بەپێی بروسکەی (عەلی ئیحسان پاشا) لە30/تشرینیيەکەم/ 1918 .

6- دەستوری 1925، بەڵێنی حکومەتی بەریتانی و عێراقی هاوبەش، بەڵێنی عوسبەلە 1922، 10 تەعەهوداتەکەی سالی 1932، دەستوری 1958، بەیانی 29 حوزەیران، بەیانی (11)ی ئازار، یاسای ئۆتۆنۆمی1974، بەندی (7) و بڕیاری 688، بڕیاری 986کە ڕێژەی

13٪تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاری کرا لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان...، یاسای انتقالی 2003، دەستوری عێراقی نویێ.

لەسەر ئەو بنچینە پتەوانە مافی چارەنوس بۆ کوردستان حاشا هەلنەگرەو هەتا شۆڤینیەکانیش بوێری ناکەن نکولی لێبکەن ،هەمو سەرکردە مێژوییەکانیش ئەوە داوایان بوە لەزۆربەی کۆنگرەکان ئەو داوایە هاتوە، بەیانی فیدرالی 1992/10/4 گوزارشە لەو مافە ،حکومەتی عیراقیش ئەو مافەی قەبول کردوە .

**لایەنە یاساییە دەڤەری و نێودەولەتیەکانی :**کوردستان خاوەنی هەرسێ پای دەوڵەت (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی) مادەی (1)ی ریکەوتنامەی مونتیڤیدیۆ،مادەی (1)ی بەشی یەکەم و ماددەی (55)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان،مادەکانی(58-60)ی (فصل العاشر- قبول أعضاء جدد)ی (مجلس الأمن)، بڕیارەکانی ژ:1514ی خولی(15)ی 14/دیسمبر/، 1960، بڕیاڕی ژ: 2105 خولی (20)ی دیسمبری 1965، بڕیاڕی ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 ، بڕیاڕی ژ: 3070خولی(28)ی نوڤمبری 1973 ، هەروەهابریاری 3314سالی 1974...... هەمو ئەوانە داکۆکی لەمافی چارەنوسی گەلان دەکا کە پاساو و مقەوماتی یاسای نێودەوڵەتیە بۆ هەرێمی کوردستان، ئینجا چەندین پالپشتی یاسایی تر هەیە مافی چارەنوس پتەو تر دەکا لەسەر هەردوو ئاستی کوردستانی گەورەو باشوری کوردستانیش ،باشور زیاتر وەردەگرین ، مەرجی توند بۆ لکاندنی کوردستان بە عێراق دیاری کرا ،ئەوەش لە: ڕاپۆرتی گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ ، دەستوری 1925، بەڵێنی حکومەتی بەریتانی و عێراقی هاوبەش، بەڵێنی عوسبەلە 1922، 10 تەعەهوداتەکە، دەستوری 1958، بەیانی 29 حوزەیران، بەیانی (11)ی ئازار، یاسای ئۆتۆنۆمی1974، بەندی (7) و بڕیاری 688، بڕیاری 986کە ڕێژەی 13٪تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاری کرا لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان...، یاسای انتقالی 2003، دەستوری عێراقی نویێ..هاتوە .

گرفتەکانی: سەرەرای ئەوەی لەکوردستان پایەکانی دەوڵەت هەبوو، کەچی بەدەوڵەت نەگەیشتن مەینەتی کوردی لیٚ دروست بوو، ئەوەی زیاتر ئالۆزی کرد ئەوەیە لەدوای دروست بونی ئەو دەوڵەتانە و دروست بونی (عصبە الامم 1919) ودواییش (نەتەوە یەکگرتووەکان 1946) تا ئیٚستا 193 ولاٚت ئەندامن لیٚ ی، بستە خاکیٚك لەو جیهانە نەماوە بیٚ سەروەری، هەموی مولٚکی دەوڵەتیٚکە لەو دەوڵەتانە، بۆیە جاریٚ بانگیشەی مافی چارەنوس بۆکوردستانی گەورە زۆر سەختە ، بۆ ئەوەی کورد بە مافی چارەنووسی بگات دەبیٚ:

1 ـ سنوری چوار ولاٚتی گەورەی ڕۆژهەلاٚتی ناوەڕاست تیٚك بدات .

2 ـ بناماکانی سایکس پیکۆ، (عدم المس بالأرث الإستعماری) وبنەماکانی ئایزنهاور ..کە بە نەگۆڕ هاتوە هەمو تیٚك بدەی .

3 ـ ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل دەستکاری بکەی کەلەسەرەتای سەدەی بیستەم ئەو نەخشەودیزاینەی لەسایکس بیکۆ تاسیڤەرو لۆزان بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست لەو پیناوە هاتوە .

4 ـ تیٚك دانی ئەونەخشەیەی ولاٚتان کەدەقی پیٚوە گرتوەو چەندین ڕیٚکەوتنی ئیقلیمی ودەوڵەتی نویٚی لەسەر بینا کراوە. ئەوهەمو بەرژەوەندیە گەورە ئابووری وسیاسیانەی لەسەر ئەو سەرخانە دروست بوە هەموی تیٚك بدەی .

ئەوە کاریٚکی ئاسان نیە بە خەم ساردی وگەندەلی وپەرتەوازەیی وبیٚ ستراتیژیەت ناکریت، بۆیە دەشکریٚ لە قۆناغی یەکەم هەر پارچەیەك جۆرە تایبەتمەندیەکی خۆی وەرگریٚت .

لەلایەکی تریشەوە هەرچی ڕیٚکەوتن و بنەمای یاسایی نیٚو دەوڵەتیە لەنیٚوانیان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی ئەو وولاٚنە خۆیتیان، واتە ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وولاٚنە رەچاو دەکریٚ کە بریتیە لە: پاڕاستنی یەك پارچەیی خاکیان (هەریٚم) و دەست تیٚوەرنەدان لەئیش و کاری ناوخۆ، کەواتە هەتا بنەماکانی نیٚو دەوڵەتی بە ئاشتی و ئارامی وپیٚك گەیشتن و هاریکاری (وفاق الدولی) لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاوبەش بیٚت، ئەوا بواری جم و جۆل وتەکان بەرەو رزگاری میللەتی ژیٚر دەستە

تەنگ دەبێتەوە، ئەو کاتە میللەتی بێ دەوڵەت ناخوێنرێتەوە، هەرچەندە ناوی (امم المتحدە) بەڵام لەڕاستیدا (دول المتحدە)یە، سزا بۆ میلەتان هەیە بۆ دەوڵەتان نیە، سزای هەرەتوندی (UN) بۆ دەوڵەتان لەبەندی حەوتە کە لەمادەی 39 را دەست پێ دەکا تامادەی 51، هەروەك عیراق پێ سزادرا لەدوای بریاری 661 ی 1990، ئەو بەندە سزایەش بۆ ئەو دەوڵەتانەیە کە دەبنە مایەی هەرەشە لەسەر ئاشتی و ئارامی نێودەوڵەتی، بەو شێوەیە هەرەشە لەسەر میللەتانی ژێر دەستە وبێ دەستە نابێتە هۆی دەرچوونی بریارێك بەپێی بەندی 7، هەروەك بینیمان ئەو هەمو سەرکێش و تاوانانەی عیراق (هەتا ئەنفال و کیمیاویش) نەگەیشتنە ئەو سزایە، بەڵام داگیرکردنی کویت گەیاندیە ئەو سزایە، تەنانەت بریاری 688یش بۆ کورد دەرنەدەچوو ئەگەر نامەکەی وەزیری دەرەوەی ئێران و تورکیا نەبوایە ، لێرەوە میللەتانی ژێر دەستە ـ بەتایبەتی کوردستان ـ دووچاری بنەمایەکی زۆردەگمەن دەبێت، ئەویش دروشمی (باکونین)ە کە دەڵێ (تحطیم کل ماهو قائم خیر)[779]، هەرچەندە باکونین مەبەستی لەو بنەمایە بۆ شۆرشی کرێکارانە لە دژی سەرمایەداری، کە بەدروشمێکی و بێ سەروبەر (فەوزەوی) بەناو بانگە، بەڵام بۆ کوردستان گونجاوە، دەبینین مافی چارەنووسی کوردستان لەو دەروازانەوە دێت کە دژ بە واقیعە، دژ بەنەخشە ڕۆژهە ڵاتی ناوەڕاستە، دژ بە (وفاق)ە، دژ بەرێساکانی یاسای نێودەوڵەتیە، .... هتد، سوودمەندە لە هەلەی ستراتیژی وولاتی داگیرکەر یاخود هەر ستراتیژیەکی نێودەوڵەتی، ئەزمووتی سەدەیەکی رابوردووی تەمەنی بزوتنەوەی کوردایەتی ئەوەی سەرووی سەلماندووە.

## مافی چارەنووسی گەلی کوردستان بەپێی شەریعەتی ئیسلامی

لەدوای دروست بوونی وولاتانی ناوچەکە بە پێی پرۆژەی ئیستعماری لەوانەش دەولەتی عیراقی هەولدراوە هەندێ بنچینەی سیاسی ویاسایی ومیژووی وجوگرافی بۆ ئەو پرۆسەیە بدۆزرێتەوە ، لەوەش زیاتر هەولدراوە بنچینەیەکی ئاینیشی بۆ بدۆزرێتەوە ،ئیتر یەکیتی خاکی عیراق بە پیرۆزوبە بەشێك لە ئاین هەژمارکراوە ،فتوای وادراوە دەستکاری عیراق حەرام کراوە(ئاگادار نەبوە لە بنەچەدا

[779] بروانە: باکونین __ مبادئ الثورة

فتواش هەبوە دژی دروست کردنی دەولەتی عیراقی ) ،ئەوەش هەمان بنەمای ئیستعماریە بۆ ئەو وولاتانە کە پێی ووتراوە (عدم المس بالارث الاستعماری) ،زۆربەی جار ئەو تەقەلایانە لەلای وەعازولسەلاتینەکان دەرچوە ،بەلام جاریش وایە دام ودەزگای تریش تێوەگلاون ،بۆیە دەبینین چەندین فتوای پیچەوانەی مافی چارەنوسی کوردستان هەیە ،لەوانە هەلویستی (اخوان المسلمین)ی عیراق ،لە (بلاوکرایەوەکی ئیخوان ژ:3)دروست بوونی دەولەتێکی کوردی لەلایەن ئیخوانی عێراقیەوە بە (حرامی شەرعی) وەسف کراوە،جیابوونەوە لەعیراق حرامە(وادیارە ئاگادار نین کە لە بنەچەدا فتوا هەیە دژی دروست کردنی دەولەتی عیراقی )[780]،ئینجادەلێت چارەی کیشەی کورد بە جیابوونەوەی ومافی چارەنوس ودەولەت دروست کردن نیە ،بەلکو بە هاوولاتی بوونی ئیسلامیە ،بۆیەش ناوی بزوتنەوەی کورد بە شۆڕش ناهێنن بەلکو بە (مسلحین الاکراد)دەهێنن ،کەچی لە بڕیاڕی ژ:12ی کۆنگرەی شەشی (اللجنه المرکزیه العلیا لجماعه الاخوان المسلمین -کە 22بڕیاڕی لێدەرچوو) داوای گەڕانەوەی ئەسکەندەروونەی تورکیا بۆ عرب دەکەنەوە ،هەروەها ئەو فتواو هەلویستەیان وەرنەگرت کە سودان لە 1952/2/22 لە میسر جیابۆوە ..،ئەگەر هاوولاتی بوونی ئیسلامی بۆ عیراق چارەی کیشەی کوردوعەرەب دەکات بۆ ئەوە چارەی عەرەب وتورك لە تورکیا ناکات ،بۆ میسرو سودان نەبوو..،لەوەش خراتر لە بلاوکراوەی 28/ئایار/1964 لەبارەی(میثاق الوحدة العربیة) بەتایبەتی وحدەی عێراقی ومیسری ئەوسا بەتوندی لایەنگیری کراوە، لەگەل ئەوانەش ناشبێ ئەوەش لەبیربکەین لەهەمان کاتدا دژ بەوهەلمەتەی حکومەت بووینە بۆ سەرکورد وبنەمای(هاوولاتی بوون)یان کردۆتە چارەسەر[781]،جاریش وایە زیاتر لەوە یارمەتی کوردیان داوە بوویتە هۆی توومەت لەلایەن حکومەت[782]، بەهەمان تەرازووی لەنگ د قرزاوی و هەندی زانای تری عەرەب لە بارەی حرامی جیابوونەوەی خوارووی سودان بەهەمان پاساو بووە، گوایە جیا بوونەوە لە جسمی ئیسلام حەرامە!

---

[780] بروانە : الحرکة الوطنیة فی العراق ص118-119 هەروەها (الاسلام والعلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص229

[781] بڕوانە:الإخوان المسلمین فی العراق(1959-1971)-دکتورە ایمان عبدالحمید دباغ -ص590 ،ص579

[782] (الإخوان المسلمین فی العراق ص591-نوسراوی ژ:م ا ب/5860لە 1962/9/23 ئاسایشی عێراق .

هەلەکوشندەکە لەوەیە کوا ئەو وولاتانەی عربی جسمی ئیسلامن ئەوانە بەدەستورو ئینتماوە عەلمانین دوور لە ئیسلام.

لە ڕاستیدا مافی چارەنوس بەسادەیی لە چەندین لاوە زەق دەبێتەوە ،ئەگەر پرسیك هەیە ڕوونی بکەینەوە ،کورد لەگەل میلەتانی عرب و فارس وتورك یەك ئومەتن بەلام یەك گەل نین ،گەلی جیاجیان ،ئەگەر ئومەت هەبوو واتە خەلافەت هەیە ئەو کاتی پرسی گەل ونەتەوەو نیشتمان لە دارالاسلام وخەلافەت دەتویتەوە ،مادام ئومەت نیە واتە هەریەکە میلەتیکن ،داگیرکەران مەبەستی خۆیان بەوە دەشارنەوە دەلێن ئێمە یەك گەلین،ئەوە وانیە ،لێرەدا بنچینەیەکی فقهی بۆ مافی چارەنوس دروست دەبێت .

بناغەی ڕەوایی دۆزی کورد لەوە دێت کە هەولّی ژێردەستەی دەدرێت و وەك بنەمای گشتی ئایینی ئەوەی قەبوولّ نییە ، بەکورتی چەندین بنەمای تر هەیە ڕەوایەتی دۆزی کورد و مافی چارەنووسی دەشەرعێنیّ ، تا ئەو ڕادەیە دەیکاتە ئەرکێکی ئایینی ، لەوانە:

بە پێچەوانەی هەردوو بزووتنەوەی تورکی و عەرەبی لەسەر حیسابی ڕووخانی خەلافەت دروست بووینە ، بەو شێوەیە ئەو دوولایە بەدژایەتی ئایینی هاتینە کایەوە وەك پرۆژەیەکی ئیستعماری.

ڕەوایەتییەکی تری ئەو دۆزە لە دروشمە دەگمەنەکەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دێت کە بریتییە لە : یان گێڕانەوەی خەلافەت یان دەولّەتێکی کوردستانی بۆ ئێمەش ، ئەوە پێناسی ڕاستەقینەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانە بەپێی شەریعەت .

بەپێی بنەمای ( وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ) ئەو بنەمایەی (تعارف) دەبێت بێتەدی لەهەر سەردەمێك بە دیزاینێکی سیاسی ، لەو سەردەمە بە ئامرازی دەولّەت دێتە دی ، کەواتە ئەگەر کورد نەگاتە مافی چارەنووس و دەولّەتی نەبێت ئەوە ناتوانی ئەو ئەرکە خواییەی (تعارف الشعوب) بێتە دی ، کە بریتییە لە هاریکاری میللەتان بۆ گەشەو بەرپای شارستانی و ئیعماری زەوی .

بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی میللەتان دەبیّ (مەوەدەو رەحمە) بێت نەك داگیرکاری و ناکۆکی و (ئیکراهی) کە لە ئەنجامی نەبوونی دەولّەت دێتە دی .

هەندێ ڕێسای تر هەیە بە ڕوونی ئەو مانایە دەدات ، وەك : (حفظ الاوطان مقدم على حفظ الاديان) ،**یان چەمکی (العباد والبلاد)** ئینجا بەپێی فەرموودەی (انصر اخاك ظالما او مظلوما) لە پەرەگرافی

دووەم کە برای نەتەوەییت زوڵمی لێکرا دەبێت سەرکەوتووی بکەی ، فتوایەکی تری ابن تیمیە بەرامبەر داگیرکەریمەغۆل ووتبووی :داگیرکەرداگیرکەرە ئەگەر قورئانیشی بەسەر سەرەوە بێت ،هەروەها فتوایەکی تری یەك لە شیخەکانی ئەزهەر بەناوی (الجبراتی) دژ بە داگیری ناپلیۆن بۆ وولاتی میسر[783]...لەگەڵ زۆر پاساو و ڕەهەندی تر کە لێرە هەر ئەو پانتاییەی بۆ دیاری کراوە ، بە هیواین بوار هەبێت بە درێژی لەو بابەتە بدوێین چونکە بۆ مامۆستایانی ئایینی و هەموو لایەك گرنگە .

سەرەڕای ئەوانەش چەندین قتوای تر هەیە لەو بارەیەوە لەهەموویان گرنگ تر ، ئەو فتوایەی خوارەوەیە کە ریکخراوی ستاندەر پێی هەلساوە ،ئەوەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

الفتوى الشرعية لاستقلال كوردستان

ضمن نشاطات منظمة ستاندارد الرامية لبناء الدولة الكوردستانية، قامت المنظمة وبالتعاون مع اتحاد علماء الدين الإسلامي بعقد مؤتمر لخمسين عالم وأصدروا الفتوى الآتية:

بسم الله الرحمن الرحيم

م/ مشروع وثيقة شرعية لاستقلال كوردستان

تأسيا بقول الله تعالى: ((يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير))، وبما أن الشعب الكوردي هو الذي اختار الدخول في الإسلام طواعية، ولم يصدر منه أي انحراف عن شرعه الشريف طوال تاريخه، ولأنه ظلم وحرم من حق تقرير المصير وإعلان دولته المستقلة استنادا إلى مؤامرات دولية وفتاوى ظالمة، وبما أن قادة الثورات الكوردية كانوا من العلماء والمشايخ، وإنما قاموا بثوراتهم وفقا لقوانين الشرع الإسلامي الحنيف، وامتدادا لجهودهم العملية في هذا الميدان اجتمع نخبة من علماء الإسلام في كوردستان بدعوة

[783] بۆ ئەو فتواية بروانة :مانسفيلد – تاريخ الشرق الاوسط ص84

كريمة من منظمة ستاندارد في أربيل، في يوم الأربعاء 2014/3/5، وبعد تبادل الآراء ومتابعة الضوابط الشرعية أصدروا مشروع الوثيقة الشرعية الآتية بشأن استقلال كوردستان:

((استنادا للمقاصد الشرعية والأدلة الفقهية، فإن الشعب الكوردستاني له الحق الكامل في تقرير مصيره وإعلان دولته المستقلة، وهذا حق وهبه الله تعالى لهم، وليس لأحد أن يحرمهم منه، وهم بذلك إنما يقررون حقا إلهيا مقررا لهذا الشعب، ويقوون جسد الأمة الإسلامية كما حموا كيانه في السابق)).

والله من وراء القصد...

ملاحظة: نوصي بعقد مؤتمر موسع للمصادقة على هذه الفتوى ودعمها وتعميمها.

لەچوارچێوەی ململانیی خواروو و سەرووی یەمەن لەبارەی مافی چارەنوسی یەمەنی خوارووی جاران ،کار گەیشتە ناکۆکی نێوان زانایانی هەردووبەش ،بەجۆرێك هەر لایە فتوای پیچەوانەی لاکە دەرکرد ، سەروو دەیان ووت مافی چارەنوس دژبە خوایە لای خوارووش دەیان ووت لەگەل خودایە ،ئەوەی خوارەوە دەقی فتواو وەلامەکەی زانایانی خواروە کە بەناڕاستەخۆ کوردستانیش دەگرێتەوە ،ئەوە دەقەکەیەتی:

بسم اللة الرحمن الرحيم

بيان الهيئة الشرعية الجنوبية في الرد على مغالطات ناطق هيئة علماء اليمن

الحمد لله وأشهد ان لا إله الله وأشهد أن محمد عبده ورسوله صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيرا أما بعد: فقد وقفت الهيئة الشرعية الجنوبية للدعوة والإفتاء والإرشاد أمام ما تفوه به الناطق الرسمي لما يسمى( هيئة علماء اليمن) زاعما ( أن حق تقرير المصير الذي يرفعه الجنوبيون اليوم شعار باطل ولا يجوز شرعا...وأكد أن تقرير المصير معناه المسير للجاهلية وإحياء العصبيات المنتنة المناطقية وغيرها.(

وإن الهيئة الشرعية الجنوبية استشعارا منها بواجب المسئولية المناطة بها تجاه قضية شعب الجنوب لتؤكد على الأمور الآتية: أولا : إن شعب الجنوب قد حسم أمره ولا خيار أمامه سوى التحرير والاستقلال وهو يرى أن الوضع القائم اليوم هو احتلال للجنوب ومن حقه شرعا أن يقاوم المحتل لأرضه وهو متمسك بخيار النضال السلمي حتى نيل التحرير والاستقلال.

ثانيا : إن الادعاء أن حق تقرير المصير الذي يرفعه الجنوبيون شعار باطل ولا يجوز شرعا دعوى عريضة

فما دليلها وقائله متقول على الله لكونه نسب حكما إلى الله من غير دليل ولا نص قاطع قال تعالى ( قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين) البقرة (111) وهذا المتقول على الله نذكره هو وأمثاله من المفتئتين على العلم بقوله تعالى (ولا تقولوا لما تصف ألسنتكم الكذب هذا حلال وهذا حرام لتفتروا على الله الكذب إن الذين يفترون على الله الكذب لا يفلحون) النحل (116)، قال غير واحد من السلف ليحذر أحدكم أن يقول أحل الله كذا أو حرم الله كذا فيقول الله له كذبت لم أحل كذا ولم أحرمه.

فكيف يدعي العلم من يخدع الناس ويغرهم بمثل هذه المغالطات ولا علم له بحكم الله ورسوله.

ثالثا : إن حق تقرير المصير لا ينافي شرع الله لأنه قد يكون مصلحة شرعية تجنب المسلمين في الجنوب والشمال الفتن وإراقة الدماء وتضع حدا للظلم والاستبداد وتفشل سياسة التدخل الخارجي في شئون البلد وحيثما وجدت المصلحة فثم شرع الله.

وبالنظر إلى ما آلت إليه الأمور في الجنوب نجد ان أصدق وصف ينطبق على الوضع القائم في الجنوب أنه كارثة إنسانية ومأساة شعب فالوحدة المغدور بها تحولت إلى احتلال للأرض ونهب للثروة وإقصاء وتهميش لشعب الجنوب بأكمله وسفك دماء أبنائه وممارسة العنصرية عليهم وظلمهم بالتضييق عليهم في أرزاقهم ومعاشهم ناهيك عن الكثر من المواقع الاستراتيجية والأثرية في عدن وحضرموت وشبوة وسقطرى والمهرة والتي قد تم الاستيلاء عليها من قبل زعماء الحرب والفيد السياسي وكذلك البسط على الأراضي والتي معظمها لملاك جنوبيين والاستحواذ على حقول النفط والمساحات المائية والشواطئ البحرية والتي وزعت كمكرمات رئاسية وتم العبث بها بصورة مزرية ضمن عملية نهب ممنهجة ومنظمة لشيوخ قبائل ومتنفذين من القادة العسكريين والأمنيين والتجار والشخصيات المدنية ذات النفوذ في دولة الاحتلال حتى تم التكالب على الجنوب كتكالب الأكلة على قصعتها فصار الجنوب - وللأسف - مائدة مستباحة لمن لا عهد لهم ولا ذمة.. ثم يأتي بعد ذلك من يشرّع لمثل هؤلاء ويصادر حق الجنوبيين في تحرير أرضهم وسعيهم لاستقلال بلادهم من هذا المحتل الغاشم فواعجبا لهذا التلاعب بنصوص الكتاب والسنة من أدعياء العلم.

رابعا :- أما الادعاء ان حق تقرير المصير يتنافى مع عقيدة المسلمين لان الله هو من يقرر مصير الناس كلمة حق أريد بها باطل فحق تقرير المصير لا يتنافى مع معتقد المسلمين في أن الله هو المقدر لكل شيء ولا يقع شيء في ملكه الا بمشيئته.

ومن المعلوم أن أهل السنة والجماعة قد اثبتوا للعبد مشيئة فجعلوا مشيئته متعلقة بمشيئة الله وليست مستقلة عن مشيئته سبحانه وتعالى ولهذا قال الله تعالى

)وما تشاءون إلا أن يشاء الله إن الله كان عليما حكيما ) ( الإنسان -30) وقال سبحانه وتعالى ( وما تشاءون إلا أن يشاء الله رب العالمين ) ( التكوير -29(

فأثبت للعبد مشيئة وإرادة هي من صفاته وربط مشيئته بمشيئته سبحانه وتعالى.

ولازم كلام هذا الناطق بما يسمى (هيئة علماء اليمن ) أن الشعوب لا تقدر على شيء من دفع المظالم عنها وتغيير الواقع الاستبدادي في الحكم وذلك مناف لما يقع من وقائع وأحداث في حياة الأمم والشعوب وآخرها ثورات الربيع العربي والتي اطاحت بأعتى الأنظمة طغيانا وجبروتا مع العلم أن كل ثورات الربيع العربي داخلة في مفهوم حق تقرير المصير للشعوب والأمم فلماذا لم ينكر هذا المدعي على ثوار التغيير والذين أعطي لهم صك براءة الاختراع ويقول إن شعار التغيير باطل ولا يجوز شرعا كما قال على شعار الجنوبيين ومطلبهم، أم أن الأمر كما قيل (يقول الخنا أبغض العجم ناطقا ) وصدق الله القائل (فإن لم يستجيبوا لك فاعلم أنما يتبعون أهواءهم ومن أضل ممن اتبع هواه بغير هدى من الله إن الله لا يهدي القوم الظالمين ) (القصص - 50 ).

والحاصل أن ما قرره هذا المدعي هو حقيقة مذهب الجهمية الجبرية القائلين بأن الإنسان لا يقدر على شيء ولا يوصف بالاستطاعة وإنما هو مجبور بأفعاله لا قدرة له ولا إرادة ولا اختيار وهذا هو لازم قوله.

نعم إن كل شيء بتقدير الله عز وجل لا يخرج عن تقديره شيء من الخير والشر فكل شيء يجري بتقديره وليس بملكه سبحانه وتعالى شيء لم يقدره ولا يريده فمشيئته سبحانه وتعالى وإرادته شاملة لكل ما يقع في

الكون من خير وشر وهدى وضلال ولكن العبد مأمور بدفع المفاسد وجلب المصالح والأخذ بالأسباب الجالبة للمنافع فله القدرة من جهة الصحة والوسع والتمكن وسلامة الآلات.
فأمر الشارع الحكيم العبد بالأخذ بالأسباب والاستعانة بالآلات التي زوده الله بها ليجلب المصلحة والمنفعة المأمور بهما شرعا ويدفع المفسدة والمظلمة المنهي اجتلابهما فهو يعمل بها وفق مقتضى مشيئته سبحانه وتعالى ومن تأمل الفرق بين مشيئة الله تعالى وإرادته ومشيئة العبد وقدرته زال عنه الإشكال.
فإذا كان الجنوبيون يسعون إلى التحرير والاستقلال أو يريدون حق تقرير مصيرهم فإن ذلك الحق يندرج في هذا المعنى، وهو من باب دفع المفاسد وجلب المصالح وغير خاف على أحد المفاسد الجمة الواقعة على الجنوبيين في الدين والنفس والمال والعقل والعرض، والشريعة الإسلامية إنما جاءت لتحقيق المصالح وجلبها ودرء المفاسد ودفعها.
خامسا :- إن السعي إلى حق تقرير الشعوب مصيرها بنفسها يُدرج في قاعدة الاستطاعة والقدرة التي أثبتها الشرع الحنيف للعبد وهيئ بمعنى الصحة والوسع والتمكن وسلامة الآلات كما أسلفنا وهي التي تكون مناط الأمر والنهي والثواب والعقاب وهي المصححة للفعل وعليها يتكلم الفقهاء وهي الغالبة في عرف الناس.
وقد يكون حق تقرير المصير من جنس الاستطاعة التي يجب معها وجود الفعل وهذه هي الاستطاعة المقارنة للفعل الموجبة له وهو قول أهل السنة والجماعة وعليه محققو المتكلمين والفقهاء والمحدثين وغيرهم وبهذا ينحل الإشكال ويتضح المقال والحمد لله على كل حال.
سادسا :- قوله إن حق تقرير المصير معناه المسير إلى الجاهلية جهل بمعاني الألفاظ العربية فالمصير – بالصاد – غير المسير – بالسين – والفرق بينهما معلوم والبون بين معنيهما شاسع، وإن قصد تفسيرها على خلاف معناها اللغوي فهو بعيد كل البعد عن العقل والمنطق وهذا لا يجوز ولم يستخدمه الفقهاء لأن المعاني البعيدة عن لفظ الدلالة المباشر معيب عند المفسرين وغيرهم.
أما الجاهلية التي تحدث عنها فهي حال دولة الاحتلال المعطلة لشرع الله والمحاربة لحكم الله في دستورها وقوانينها في مؤسساتها وأجهزة إعلامها.
وأما إحياء العصبية المنتنة المناطقية التي تكلم فيها ناطق الهيئة اليمنية فهي مردودة عليه لأننا لا نعلم في عصرنا الراهن دولة مارست العنصرية كدولة الاحتلال اليمني التي تعاملت - ولازالت – بعنصرية مع الجنوبيين فمقولة إن أهالي عدن وحضرموت ما هم إلا بقايا هنود وصومال لم تنمحِ من الذاكرة.
والتصريح الذي أطلقه أحدهم وهو قائد حزب إسلامي حين قال في مقابلة متلفزة له "إن من حق الشماليين أن يزجو بالملايين في الجنوب لتغيير التركيبة السكانية" لازالت تمارس ضمن سياسة استيطانية ممنهجة.
وتصعيد التوتر بين الجنوبيين والشماليين عبر سياسة إعلامية خبيثة ينتهجها إعلام دولة الاحتلال لازال هو السائد كثقافة يتم الترويج لها والهدف منه تحريض الشماليين على الجنوبيين وإشعار الشماليين أنهم متميزون على الجنوبيين في التمسك بالدين والاعتزاز بالقبيلة- زعموا - واستخدام ما تسمى (لجان حماية الوحدة والدفاع عنها ) وإشراكها بالعنف ضد الجنوبيين مما زاد من احتمالات العنف بين الجنوبيين والشماليين على المستوى المجتمعي في مدن الجنوب وغيرها كثير مما لا يتسع المجال لذكرة وسرده.
سابعا:- كان الأولى بهذا الناطق وأمثاله الذين صمتوا دهرا ونطقوا زورا أن ينكروا على من يدقون طبول الحرب بالتحريض على الجنوبيين بالفتاوى التكفيرية المؤدية إلى صراع لا يحمد عواقبه وكذلك إثارة الفتن وسفك الدماء وانتهاك سيادة البلاد بالسماح للطائرات الأمريكية بدون طيار التي تستهدف التجمعات السكانية في المدن والأرياف وقد حصدت مئات أرواح الأبرياء في مدن الجنوب في لحج وأبين وشبوة وحضرموت.
كان الأجدر بهذا الناطق أن يعلن الحرب على الفاسدين الذين نهبوا المال العام وتاجروا بالمخدرات والمبيدات السامة وتعاقدوا مع شركات مشبوهة لدفن النفايات النووية في صحراء حضرموت جالبة لسكانها أمراض السرطان والأورام الخبيثة.
إذاً كانت الأمانة العلمية تقتضي - لو كان أمينا - أن يطالب الشعب بمحاسبة من تسبب في انهيار العملة واقتصاد البلد وفشل الدولة إداريا وماليا وحول الوحدة المغدور بها الى احتلال واغتصاب للأرض بنشر

إشاعة عودة الفرع إلى الأصل حتى جعلوا الناس يستمرؤون الظلم وقادوهم إلى الذل والهوان.
ثامنا :- إن التلاعب بالفتاوى بهذا الشكل المزري من قبل علماء دولة الاحتلال اليمني هو الذي فتح الباب على مصراعيه لإراقة المزيد من دماء الجنوبيين من قبل جنود الاحتلال وعصاباته المسلحة التي عاثت وتعيث فسادا في أرض الجنوب وأي جريمة هي أعظم من سفك دم امرئ مسلم بغير حق وكان آخرها ما شهدته مدينة الحوطة بمحافظة لحج من اغتيال الطيارين الثلاثة واغتيال جندي آخر بعدهم بيوم ضمن عملية ممنهجة تستهدف تصفية الكوادر الجنوبية الكفؤة فإلى الله المشتكى.
وختاما فإن الهيئة الشرعية الجنوبية تناشد كل الجنوبيين عدم الاكتراث بفتاوى علماء دولة الاحتلال لأن دافعها الهوى والتعصب المقيت وإن أخرجوها في قالب حسن مستخفين بعقول الناس ليتوصلوا بهذه الطرق والأساليب إلى إبطال الحق وإثبات الباطل فالله المستعان.
وبهذه المناسبة تدين الهيئة الشرعية الجنوبية ما تعرضت له صحيفة) عدن الغد) من تهديد وكذلك رئيس تحريرها الأستاذ فتحي بن لزرق من الوعيد بالتصفية الجسدية و كذلك ندين ما تتعرض له صحيفة ( الجنوبية ) من مضايقات ونعلن تضامننا معهم ووقوفنا إلى جانبهم ونساندهم في السر والعلن والسراء والضراء.
كما أننا نتوجه لشعبنا الجنوبي بالزحف إلى العاصمة عدن لإحياء فعالية المليونية الكبرى للذكرى التاسعة عشر لفك الارتباط 21 مايو استجابة لنداء السيد الرئيس علي سالم البيض.
والله الموفق للصواب وهو المعين على نيل المطلوب وصل اللهم على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم والحمد لله رب العالمين.
صادر عن الهيئة الشرعية الجنوبية للدعوة والإفتاء والإرشاد.

+بۆ زیاتر زانیاری باش ونزیکترین سەرچاوە :الملف القانونى لحق تقرير المصير وفق قوانين الدولية —اعداد :منظمة ستاندر.

(25)

**کۆمەڵەی گەلان** عصبة الامم The League of Nations

ئەوانەش دەگرێتەوە ( کۆسمۆپۆلۆتی ، جنرال سمتس، ساتران، دادگای لاهای،حکومەتی جیهانی ،هاوولاتی گەردوونی، ..)

ڕێکخراوێکی نێو دەوڵەتیە پیکهاتوە لە نوینەرانی دەوڵەتان لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم(1914- 1918)دروست بوو لەسەر دەستی وولاتانی براوە ،بەمەبەستی چارەسەری کیشە نێودەولەتیەکان پیش ئەوەی ببتە جەنگ ومالوێرانی ،تیایدا کۆمەلیك دام ودەزگای بۆ تەرخان کرا ببتە بەدیلی چارەی کیشەکان لە ڕێی هێز .

پێویستی : لە کۆنەوە بەهۆی پێویست بەدەزگایەکی وەك نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ لێککردنەوەی کێشە جیهانیەکان بیری جیاجیا گەلالە کراوە،جاران(ساتران-خواوەندیکی کۆنی بابلی وعەجەم)بوە کە کاری لیککردنەوەی شەڕو بەدادگەریانە سنورەکانی بۆ ئیمپراتۆریەکان ڕێکخستوە[784]،بەو شێوەیە ئەگەر ئەو دەزگایەش نەبووبێ زانراوە پپویستە ، هەروەك چۆن دەولەت پێویستە بۆ پاریزگاری لە مافە گشتیەکانی ناوەخۆو نێوانبژی ناکۆکیەکان ، بە هەمان شێوە دەزگایەکی جیهانی ئاوا پێویستە بۆ هەلگرتنی بەرپرسیاریەتی مافە گشتیەکان ونیوبژی ناکۆکیە دەولیەکان و پاراستنی بەرژەوەندی تەواوی زەمین ، لەسەر ئەو بنچینەیە بیرۆکەی دەزگایەکی نێو دەولەتی وەك(کۆمەلەی گەلان)زۆر کۆنە لە شێوەی حکومەتی جیهانی گوزارش دەکرابەتایبەتی لە پرۆژە ئاینیەکان وشۆڕشی پیغمبەران ،لەهەموان ڕوون تر ڕەهەندی جیهانی لە ئاینی ئیسلام بەدی دەکرێ ، بەلام نەببوە پێویستیەکی زۆر تا ئاسۆکانی عەولەمە و جەنگە جیهانیەکان دەرکەوتن .

جاران لەسەردەمی کەمی پەیوەندی و پەرتەوازەیی کۆمەلگە نمونەی دەولەتی شارو باو بوو ، رای ئەرستۆ و ئەفلاتوون ئەوەبوو کە هەر شارێك حکومەتێکی پێویستە، ئەو کاتە ئیمپراتۆرەکان لە

[784] قاموس الخرافات ص137.

پیویستی ئیداری نەدەهات بەلکو بەشیك بوو لە پرۆژەی سەربازی، مەبەست و فلسفەی حکومەتی جیهانی نەدەدا ، لە فەزای ئەکادیمی باسی پلوتارخ دەکریٚ کەیەکەم فەیلەسوف بێت باسی حکومەتی جیهانی کردبێت،هەریەکە لە سوکرات وئەفلاتون ومەدرەسەی ڕەواقی بەجۆرێکی تر باسی حکومەتی جیهانیان کردوە ،دەلێن بەختەوەری مرۆڤ بەوە دێتە دی کە هەمو کۆمەلگە بکەونە ژێر یاسای سروشتی وجیهانی،ئەو کاتە حکومەتەکان وجیاوازیەکان دەتوێنەوە لەیەك حکومەتی جیهانی ودانیشتوانی دەبێتە هاوولاتی جیهانی ، زانایانی وەك سیسرۆن ناوی ناوە (هاوولاتی گەردوونی — کۆسمۆپۆلۆتی)[785]، سەرەڕای ئەوەش لە بنەچەدا(حکومەتی جیهانی) بانگیشەیەکی ئاینی یە، زیاتر پەیوەستە بە ئاینە کراوەکانی خاوەن دەعوە وەك مسیحی وئیسلام، بەلام مدرەسەی شیوعەتیش ئەو داوایەی بەرز کردەوە .

جارجاریش بیرۆکەی برایەتی گشت مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی ئاینی ومرۆیی باس کراوە ،زاراوەی ئومەمیەتی لیهاتە دی ، هەر لەسەر ئەو بنچینەیە ،تەقەلای یەکزمانی جیهانی و حکومەتی جیهانی ویەك کۆمەلگەو یەك ئاین ویەك ئابووری جیهانی کراوە ،بیرۆکەی یەك زمانی ناگەڕێتەوە بۆ ئاین ،چونکە ئاین باوەڕی بە فرە زمان وفرە گەل ومیلەت هەیە ،**یەکەم جار رینیە دیکارت لە سەدەی** 17 بیرۆکەی یەك زمانی جیهانی گەلالە کرد ،لە هەمان کات قەشە (جۆن کۆمینیۆس) لە بۆهیما ئەو بیرۆکەی راگەیاندو لەو کاتەوە تا ئیستا ئەو تەقەلایە بەردەوامەو نزیکەی 200زمانی جیهانی پیشنیارکراوە ، هەندیکی سروشتی وهەندیکی پاکیج وهەندیکی تریش دروست کراو ، لەوانە زمانی فۆلاپۆك (بەمانای ئاخافتنی جیهانی) کەلە 1879 لەلایەن قەشەی ئەلمانی (جوهان مارتن شیلەر) داهێنرا ، لەهەموان گرنگ تر زمانی ئسپارتۆ بوو .

ئەو پیشنیارنە بە زۆری لە دوای جەنگی سی سالە -کەلەویستیفالیای 1648 کوتایی هات- کرا دوای 5 سال لەو جەنگە تویژینەوەیەکی (ئیمریك کرۆتچیە) بلاوکرایەوە داوای کرد کۆمەلەیەکی گەلان دروست بکرێت ، یان ئەنجومەنیکی بالای جیهانی پیکهاتوو لە پاپای مسیحی وخەلیفەی

---

[785] معمر قەزافیش لە کتیبی (الکتاب الأخضر) لە بەشی (الإقتصاد ص75)بەدواوە پشت بەوەها ڕایەك دەبەستیٚ بۆ دروست بوونی تیۆری جیاهانی (سێیەم تراز) .

موسلمانان وكۆمەلیك لە پادشاو گەدای جیهانی بە ناوی ئەنجومەنی جیهانی بۆ چارەی ناكۆكی و بەرقەرار كردنی ئاشتی نیو دەولەتی ، دوای ئەمانوئیل كانت لەكتیبی (نحو السلام العالمی 1725ز) ئەوپیشنیارەی كردەوە[786] ،بەو شیوەیە ناوە ناوە لە گەل هەلگیرسانی هەر جەنگ وناكۆكیەك ئەو خواستە دەهاتەوە مەیدان ، لەسەرەتای سەدەی بیستەمیش جنرال سمتیس (خەلكی بریتانیایەو ئەفسەریكی زۆر زیرەك بوو)لە نامیلكەیەكی بچوك تیایدا باسی دیزاینی كۆمەلەی گەلان وسیستەمی ئینتدابی كردبوو،لە كاتی جەنگی جیهانی یەكەم1914-1918 لە ئەمریكاو بریتانیاوهەندێ وولاتی تری ئەوروپی بیرۆكەی دەزگایەكی دەولی وا برەوی وەرگرت ،لە ئەمریكا كۆمەلەیەك دروست بوو بەناوی (عصبە الدعم السلام)،لە بریتانیاش (جمعیە عصبە الامم) ، تا لە كۆتایی جەنگ ئەدواردگرای بە فەرمی پیشنیاركرا، ئینجا لەلایەن وینسونی سەروكی ئەمریكی لەمیانەی 14 بنەماكەی خالی چواردەمی پیشنیاری كومەلەی نەتەوەكانی كرد[787]، لە دوای جەنگی جهانی یەكەم لە رۆژی 3/ینایر/1919 بڕیاڕی دروست كردنی درا ،32 وولات كۆبوونەوە لە پەیمان نامەی فرسای28/4/ 1919 بە هۆی ئەو هەموو گیروگرفت و هەژانەی جهان ئەنجومەنێكی جهانی دانرا لەلایەن وولاتانی سەركەوتووی( فرنسا –بریتانیا-ئیتالیا -یابان -ئەمریكا ) میساقیك(وەك دەستور) بۆ كۆمەلەی گەلان لە 1919ز دیاری كرا ، لەرۆژی 1919/6/25كەوتە كار بەناوی (عصبة الامم) بارەگاكەی لە جنیف-سویسرە بوو، وەك یەكەم مەرجەعی یاسای دەولی ، لەگەل بەستنی یەكەم كۆبوونەوەی (كۆمەلەی گەلان) لە 10ی ینایری 1920 ئەودەزگایە كەوتە كار بەفەرمی .

ئامانجەكانی :

ئامانجەكانی ئەو رێكخراوە لە میساقەكەی دیاری كراوە كە پیكهاتبوو لە دیباجەو 26 مادە ئەویش لە كۆنگرەی ڤیرسای 1919 وەك بەشێك لە مەبەستەكانی كۆنگرەكانی ئاشتی هاتە كایەوە بەو ئامانجانەی خوارەوە :

---

786 العلاقات السیاسیە .. المصدرالسابقص14-15.

787 تأریخ العالم (dtv) .. المصدرالسابق ج2-ص409

1-پەنانەبردنە بەر جەنگ بۆ یەکلاکردنەوەی کیشەکان
2-بیناکردنی پەیەوەندیە نیودەولەتیەکان لەسەر بنچینەی دادگەری و هەق.
3-پابەندی بە ریساو یاساکانی دەولی.
4-ریزلە پەیماننامەو ریکەوتنە دەولیەکان بگیری

پیکهاتەی کۆمەلەی گەلان: بە مەبەستی چارەی کیشە نیودەولەتیەکان وەك یەکەم ئەزمون پیکهاتبو لەو بەشانە :

میساقی کۆمەلەی گەلان : لەپیشەکیەك و26 مادە پیکهاتوە ، کە لەبەشی (1) ی پەیماننامەی سیڤەر هاتوە بەناوی(پەیماننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان (**میثاق عصبة الامم**) ،لەوێش بۆ ( ماددەی 1 هەتا 26 و پاشکۆی بەشی یەکەم، پەیمانی ڤێرسایل *Versailles* لاپەڕە 10-23 بکە.

جاروایە پێی دەووترا (دەستوری جیهان)مادەکانی بەرجەستەی ئاشتی جیهان وهەندی ریکخستنی پەیوەندی دەولی بوو ، تیایدا مادەی سزای تیدا بوو بۆ ئەو وولاتانەی دەست دریژکارو هەرەشەن لەسەر ئاشتی جیهانی .

جەمعیە پیك دیت لە هەمو ئەندامان ئەسلی وتازە وەرگیراو ،هەرووی‌تیکیش یەك دەنگیان هەیە ،ئەرکی چاودیری و وەرگرتنی ئەندامی نوێو بڕیارِ بە دوو لەسەر سیّ دروست دەبوو

ئەنجومەنی ئاسایش: ئەنجومەنیکی تەنفیزی بچوك بوو پیکهاتبوو لە 8-14 ئەندام، ئەو وولاتانە بوون کە هیزدار بوون ،4 وولاتیش ئەندامی هەمیشە بوون ،خاوەنی ڤیتۆ بوون (فرنسا ، ئەلمانیا، بریتانیا، یەکیتی سوفییتی) ئەمریکا ئەندام نەبوو چونکە هەر لەبنەچەدا نەهاتە نێو کۆمەلەی گەلان ،ئەوە کاری بنچینەیی پاراستنی ئاشتی بوو .

ئەمانەتی گشتی : ئەوەش بۆ ئیدارەی گشتی نزیکەی 600 فەرمانبەری هەبوو بۆ سەرپەرشتی ریکخراوە نیودەولەتی و چۆنیەتی ئیدارەی کۆلۆنیالیەکان وڕێگرتن لە پەرەسەندنی چەك و زۆر لای تری بازرگانی و مولکیاتە گشتیەکانی دەولی .

زۆر دەزگای تر شان بەشانی کۆمەلەی گەلان دروست بوو ، لەهەموان گرنگ تر دادگای لاهای دروست بە جیا (عصبە الامم) بەلام کاری ئەوی دەکرد،وەك مەرجەعیکی یاسایی بۆ لیککردنەوەی

کیشە دەولیەکان لە چوارچێوەی میساق وهەندی ریکەوتنی دەولی . یەکەم سکرتێری (ئەریك دلامۆند)ی بریتانیا بوو تا1932.

ئەندامانی: سێ جۆر ئەندامی هەبوو ،ئەندامە ڕەسەنەکان ، ئەوانەن کەسەرکەوتوەکانن وناوی هاوپەیمانیان هەلگرتبوو هەر ئەوانەن کە لە دامەزراندنی کۆمەلەی گەلان بەشدارن لە کۆنگرەی ڤێرسای و ژمارەیان 33 ئەندامە ، دوەم بەشی ئەوانەن کەلەکاتی جەنگ بیلایەن بوون (بلجیکا وهۆلەندائیسپانیاو سویسراوووڵاتانی ئەسکەندینافی و 13ولاتی ئەمریکای لاتینی ،باقیەی تر کە داوای وەرگرتن دەکەن ودەبێ دوو لەسەر سێی ئەندامان رازی بن ، لە 1919 تا 1939 ژمارەیان گەیشتە 21 وولات هەر لەو نیوانەش 16 وولات لێی کشانەوە ، بەرزترین ژمارەی گەیشتە 60 لەسالی 1932 وکەمترینیش لە سالی 1939 بوو هاتە خوار بۆ44 وولات .

مافی ڤیتۆ

ئەو جۆرە مافە سەربارانە وێنەی هەبووە لە مێژوودا ، مافی تایبەتی وا عادەتەن بۆ کەسان و دەزگای تایبەتی بووە ، وەك کەسانی ئاینی و کەسانی کاریزمی و کەسانی بەهێز ، بەهەمان وەسفیش بۆ دام و دەزگا و تا ئاستی ولاّتان ، ڤیتۆ زاراوەیەکی کۆنی لاتینییە بە مانای (قایل نیم)، پێشتر بۆ یەکەم جار لە (ئەنجومەنی موحەلفین) لە دادگاکان ئەو مافەیان هەبووە بەناوی (ڤیتۆ) بەکاریان هێناوە ، هەندێ پادشا ئەو مافەیان لە ولاّتەکەی خۆیان پێدراوە لەوانە پاشای بریتانیا لە سالّی 1707 ز. وە ئەو مافەی بەکار هێناوە، بە هەمان ماهییەت لە جیهانی ئێستا بە رەسمی و بەپێی یاسایی ئەو مافە تایبەت و چەسپاوە، هەندێك بە ڕاستەوخۆ بەشێکیش بە ناڕاستەوخۆ، (ڤیتۆ) زیاتر بەدەسەلاّتی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایش دەگوترێ کە مافی هەلّوەشاندنەوەی بڕیاریان هەیە، (فەرنسا ، ئەلمانیا، بریتانیا، یەکێتی سۆفییێتی) .

پاساوی ڤیتۆ ئەوەیە کە تاکو (کۆ دەنگ) لە بڕیارەکان دروست ببێت بەپێی کاریگەری ئەو ولاّتانە و بۆ چەسپاندنی ئاشتی، بەپێی هەندێ فەقیهی یاسایی ئەو ولاّتە خاوەن ڤیتۆیانەش مافی بەکارهێنانی نابێ ئەگەر لایەنێك بێت لە کێشەکە ، تاڕادەیەکیش ناکۆك دەبێت لەگەلّ بنەمایەکی

(کۆمەڵەی گەلان) کە دەقەکەی وا هاتووە : (أن الاعتراف بالحقوق والواجبات واحدة لجميع الدول من مبادئ اساسية التي تقوم عليها العصبة) .

**کوردستان و عیراق لە کۆمەلەی گەلان**

لە بنەچەدا کۆمەلەی گەلان کەمتر بۆ میلەتانی ژێردەستەو کەم دەست بوە ،هەرچەندە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918) زۆر باسی مافی چارەنوس کرا بەلام لە میساق و دەزگاکانی تری کۆمەلەی گەلان جێکەوتێك بۆ ئەو مافە نەکرایەوە ، سیستەمێك داهێنرا بە ناوی ئینتداب ( mandate) ، ناکری ئینتداب بە چاکەیەکی مرۆیی پەتی لیك بدەینەوە ،هەردەبی بەرژەوەندیەکی ئەوانیشی تیدا بێت ، یەکەم جار گلادستۆنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا خۆی ووتی لە سیاسەی دەولی (چاکەو خراپەی بیهۆ-هەنگاوی مرۆڤایی بیدانایی-ناکۆکی هەمیشەیی و ودۆستایەتی هەمیشەیی نیە ..لە هەموی بەرژەوەندی هەمیشەیی هەیە) ، تەنانەت هەندی سیاسەتمەداری گەورەی بریتانیش سەری لەوە سوڕمابوو ، بەریتانیا رابەری ئیستعمارو خاوەنی هەڵگری وەسفی هندی (ئەگەر دووماسی لەدەریا بەشەر هاتن دەستی ئینگلیزی لەگەڵە)، لەئەوروپا بێت (سالانەی جەنگەکەیان 35 ملیۆن جونیەی تێبچێت) و خوێنێکی زۆر برێژی (تەنها لەعیراق 10000 کوژراوی هەبوو) [788]،دوای هەمو ئەو تێچوونانە بێت کۆمەڵە دەوڵەتیك دروست بکا، خۆی مەسروفی وەزارەتەکان و سوپاو حکومەت دابین بکا و بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، حەتمەن ئەو هەنگاوە دەیان مەبەستی شاردراوەی لەپشتە، لە مەبەستەکانی سایکس پیکۆ و ئەو دانپیاهینانەی یاسین هاشمی لەکاتی دەست لەکارکیشانەوەیسەرۆك وەزیران لە 1930/3/13 زیاتر دەردەکەویٚ کە دەلێت:((ان صلاتنا ببريگانيا-ليست مبنيه على المعاهده المكتوبهفقگ،وانماتوجد مواد لم تكتب أيچاً،ويجب على العراق أن تعترف بها،وعندژلك علمناانا محدوعون ببيان رسمى وتصريح مندوب السامى ))[789] ، سەرەڕای ئەوەش مەبەستە گەورەکەی وولاتانی رۆژئاوا ئەوەبوو چیتر ناوچەیەك نەمینیت بێبەرپرسیاریەتی بەرامبەر دام ودەزگا نیودەولەتیەکان ،لەلایەکی تریش دروست کردنی

---

[788] ـ ئەو ژمارەیە لە (کۆتلۆف– ثورة عشرين ص177)وەرگیراوە.

[789] عبدالزاق الحسنى – العراق فى ظل المعاهدات – ج2ص222

بازاڕو بازرگانی ڕێکخراو لەگەل ئەو وولاتە تازە پیگەیشتوانە، لەسەر ئەو بنچینەیە کۆمەلێك کۆنگرەو ڕێکەوتنامەی ئاشکراو نهێنی کرا بۆدابەش وچارەی ئەو پرسە ، تویژینەوەی ووردیش بۆ بارودۆخی میلەتانی ناوچەکە کرا .

ئەو دیزاینە سیاسیە نوێیەی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە پێی سیستەمی ئینتداب دروست بوو تا ڕادەیەك لەگەل دیزاینەکەی سایکس پیکۆ جیابوو ،ئیتالیا تورکیای(ئیستا)ی بەرکەوتبوو ئینتدابی وەرنەگرت ، لەلایەکی تر بەریتانیا و فرنسا هەولیان دا بەشی ئەمریکا دیاری بکەن لە ئەرمینیا، بەڵام دوای ئەمریکا بۆی دەرکەوت ئەوە فێلی لێ دەکەن، دەیانەوێ بیکەنە سەنگەر لەپیش بزوتنەوەی بەلشەفی شیوعی لەسەردەمی لینین و روسیا، ئەمریکا لەدژی ئەوهەنگاوانەی بەریتانی وهاوپەیمانان وەستا، سیاسەتی (باب المفتوح)ی بەرز کردەوەو داوای کرد ئەو وولاتانەی کەوتونە ژێر ئینتدابی بریتانی وفرنسی بە فەرمی بخرینە ژیر مومتەلەکاتی عوسبە ،بۆ ئەو مەبەستەش لەدوای سالی 1919لیژنەی (کنگ ـ کراینی) بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نارد .

**کوردستان :** دوای داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن بریتانیا ،لەماوەی سا ڵانی 1918 تا 1920 سێ حکومەت لەوخاکەی ئێستا پێی دەڵێن عیراق دروست ببوو حکومەتێك ئیسلامی لە فوراتی ناوەڕاست بە سەرۆکایەتی (ا. شیرزای) [790] ، حکومەتی دوەم عەلمانی عروبی لە بەغدا کە ڕاستەوخۆ بریتانیا دروستی دەکرد، حکومەتێکی نیمچە ئیسلامیش لە سلێمانی، حکومەتی ئیسلامی کەربەلا دانی بەو حکومەتەی سلیمانی هێنابوو، نامەی ئالۆگۆریش لەنێوانیان هەبووبە تایبەتی لە نێوان شیخ محمودو مهدی خالصی[791].

[790] وچەند ئەنجومەنێکی باڵای سەرپەرشتی کە لە 1920/8/25 دامەزران بەوشێوەیە: 1. ئەنجومەنی شارەوانی 2. ئەنجومەنی کارگێڕی 3. ئەنجومەنی جێبەجێکردن(حکومەت) 4.ئەنجومەنێکی زانستیش پێك هاتبوو لە (14) زانا بە سەرکردایەتی (شیخ الشریعە)بۆ سەرپەرشتی وچاودێری حکومەت وشۆرش بکەن . بروانە: أ-وردي... لمحات ج5ص292 ب- العراق... ج1ص166-167

[791] لەکاتی هێرشی شێخ محمودبۆ کەرکوك ئاگاداری شیخ خالصی کردۆتەوە وەك لە کتێبی (کوردستان من بداية الحرب العالمية الأولى الى نهاية مشكلة الموصل –سروة اسعد صابر ص247ههاتوة.

دوای بەریتانیا بەسەر هەردوو حکومەتی کوردستان و کەربەلا زاڵ بوو و لەنێوی بردن، حکومەتی بەغداشی پتەوکرد، لە ڕێکەوتنی سان ریمۆی 1920 دەستکاری نەخشەی سایکس ـ بیکۆ کراو ویلایەتی موسڵ (بەکوردستانیشەوە) لە بەشی (B)ی پشکی فەڕەنسی خرایە سەر بەشی (A)ی بەریتانی وئەویش خستیە سەر عیراق ، دوای لە کۆمەلەی گەلان لە1925/10/16بەرجەستەی یاسایی ئەو هەنگاوە کراو ویلایەتی موسل کەوتە سەر عیراق[792] ، وەك لە بەلگەنامەکان واهاتوە: ولایەتی موسل لە چوارچێوەی سازشێك کرا کە ویلایەتی موسل ببتە مولکی عیراق و لە بەرامبەریشدا بەریتانیا واز لە بەلێنەکانی سیڤەربێنیێ وکوردستانی سەروبۆ تورکیابە جێ بهێلی، ئەو هەنگاوەلە دیوی عیراق لەڕێکەوتنەوە بەهۆی ئامرازی سەربازی خستە سەر حکومەتی بەغداو برسی کۆکسی (حاکمی بەریتانیا لە عیراق) بەنوسراوی فەرمی ژ:4/3330ی 2/22/ 1921 فەرمانی دابو بە حکومەتی تازەی عیراقی تا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عیراق، بەو شێوەیە لە خوارووش هەوڵ و تەقەلای کورد ڕوبەڕوی پلانێکی نێودەوڵەتی مەزن بۆوەو لەگەڵ سەرکەوتنی بەریتانی و تەوەری عەلمانی بە سەر شۆڕشی ئیسلامی خوارو و کوردستان مەینەتی کورد بە یەکجاری دروست بو، ئیتر کوردستان لەنێو نەخشەی سیاسی جیهانی ناوی کوژایەوە .

ئیتر لە باشترین دۆخیدا مافەکانی کەوتە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقی، لەو بەڵێنانەش لە کۆنگرەی قاهیرە (لیژنەیەکی 4کەسی ـ کۆکس، مس بیل، لۆرانس، یۆنگ، بابکۆك، میجر نۆئیلیش وەك ئەندامێکی ڕاوێژ) بۆ مافی چارەنوس لە ژێر ڕۆشنایی سیڤەر دروستکرا)[793]، ڕێدرا حکومەتی کوردستانی لە چوارچێوەی عێراق هەبێ، ئەو واقعە قانونیە لە مادەی 16ی لائیحەی ئینتداب لەسەر عێراق دەقەکەی بەو شێوەیە هاتوە: المادة 16: لا شيء مما في هذا الانتداب، يمنع المنتدب من تأسيس حكومة مستقلة إدارياً، في المقاطعات الكردية، كما يلوح له ...[794] .

---

[792] تقرير ولاية الموصل ص10 .

[793] بروانە: قضية الكردية فی صراع البريطانی العراقی ص194 لەو لیژنەیە تەنهایۆنگ ونۆئیل لای کورد بوون.

[794] دەقی لائیحەی ئینتدابی عیراق لە پاشکۆی ژ:2 لەکۆتایی ئەو نوسینە.

دوای (**عصبة الأمم**) لەوەڵامی سکاڵایەکی کۆمەڵێك سەرکردەی کورد لە ڕێنماییەکی تایبەتی بۆ بەریتانیای دەوڵەتی(ئینتداب) نارد کەبریتی بوو لە 3 مادە تیایدا لەمادەی دووەم داواکرابوو حکومەتێك بۆ کورد پێك بهێنرێت وچیتر بە هەڵە لێکدانەوە بۆبڕیارِی ڕۆژی1925/10/16 نەکرێ[795]، لەوەش زیاتر لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی زیاتری لێهاتوەو دەڵێ بەردەوام (عصبە الامم)داوای لە بەریتانیا کردوە کەولایەتی کوردستان سەربەخۆ بێت لە ژێر ئینتداب ـ بروانە ئەو بەڵگەنامەی خوارەوە[3]، لەبەیانەدوقۆڵیەکەی بەریتانی عێراقی لە28/تشرینی دوەم/1922دیسان دان بەو مافە هێنرا[4]، دوای تا ساڵی 1932 چوار ڕێکەوتنی ئاوای دووقۆڵی کرا جارجار مافی کورد سوکتر دەبووو لە ڕێکەوتنەکان ناوی نە دەهات، بەتایبەتی ئەو ڕاپۆرتەی بەریتانی ساڵی 1932بۆ ئەوەی عیراق ببتە ئەندام لەعوسبە[798]، بە هۆی نارەزایی کورد وڕووداوەکانی بەردەرکی

---

[795]ـ دەقی بریارەکەی (عصبە الامم) لە ل457ی (المشكلة الكردية فى الشرق الأوسط) بخوێنەوە.مەبەست لـە برِیـارِی رۆژی 1925/10/16ئـەو بریارەیە کە ولایەتی موسل خرایە سەر عیراق بەپێی لیژنەکەی عوسبە.

[3] الكتاب معنونة الى ر.جيب سليد ضابط الجناح دائرة استخبارات القوة الجوية الملكية البريطانية

مقر القيادة، ذوبيان الحركة القومية الكردية

.... رغم وجود بعض الأختلافات المحلية و الأجتهادات الشخصية، هناك قناعة راسخة و مشتركة بين جميع الفئات الكردية بأن الحكم الذاتي المفروض على الكرد بفضل قوات الجيش العربية امر غير ممكن و لا يمكن القبول به. و انهم لا يستطيعون التخلي من فكرة تراودهم دوما بأن عصبة الأمم طلبت بريطانيا ان تحكم الكرد ضمن نظام الأنتداب و ان يكون هناك "ولاية كوردستان المستقلة" ضمن العراق و تتعامل مع الحكومة بوجود المندوب السامي البريطاني الذي يكون كحلقة الوصل بين الكرد و الحكومة المركزية و تكونت ادارة كل الأمور الداخلية بيد الكرد.....

[4]ـ ئەوەش دەقی دان پیاهێنانەکەیە: (( تعترف حكومة صاحب الجلالة البريطانية والحكومة العراقية بحق الكورد الذين يعيشون داخـل حـدود العـراق فـى اقامة حكومة كوردية ضمن هذة الحدود ، وتأمل الحكومتان ان العناصر الكوردية على اختلافها ستتوصل باسـرع مـايمكن الى اتفـاق فيمـا بينهـا حـول الشكل الذى ترغب ان تقوم تلك الحكومة وحول الحدود التى ترغب ان تمتد الية وان يرسلوا موفدين ذوى صلاحيات الى بغداد للتـداول فـى العلاقـات الا قتصادية والسياسية مع حكومة صاحب الجلالة والحكومة العراقية )) سروة ..كوردستان ص245.

[798]ـ لەراپۆرتەکەی بریتانیا وای باسی عێراق کردبوو کەلە هەموبوارەکان چوویتە پێش وشایستەی ئەوەی هەیە بەرپرسیاریەتی دەولەتی عیراقی پێ بسپێردرێ، کەچی وانەبوو، ئەوەش بەلگەکانی چەوتی ئەوراپۆرتەیە کەدەقەکەی لە (الاسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثة)باسمان کردوە بەو شێوەی خوارەوە: هذا التقرير لا يعكس الصورة الحقيقية لوضع العراق، ولايلبى شروط القبول فى عصبة الأمم، وكذلك يحتوى على نواقص اسياسيە کالآتى:

أـ عناصر الدولة فيه ناقصة، بخلاف شروطه، فأن الشعب متفكك والأقليم عبارة عن أوطان مختلفة، والحدود غير واضحة، والسيادتي الداخلية والخارجية ناقصة ومحتلة، اما السلطة في أقليم ضعيفة ولا تملك مقومات الدولة، وكان رأي بريطانيا الحقيقية غير ذلك الذي كتبته في هذا التقرير الى عصبة الأمم، وخير دليل على ذلك التقرير الذي أرسله (هنرى دوبس) المندوب السامي البريطاني في العراق –الى حكومته-، حيث جاء فيه ((أني أعتقد عند

سەرابۆبە ئەندام بون لە (عصبە الامم) (10) بەڵێننامەی لێ وەرگیرا، بەڵێننامەی (9 و10) تایبەت بو بەکورد..ئەوانەی خوارەوە دەقی وەلامی کۆمەلەی گەلان ومەرجەکانیەتی لەگەل بەلیننامەکان:

–قرار عصبة الأمم عام 1932:

(جوابا للكتاب الموجه من قبل بريطانيا (المنتدب) الى الجمعية، والتي تطالبها بإخراج العراق من (الفصل الأول–المادة 22 من عهد العصبة) وإدخالها الى عضوية عصبة الأمم)، وجواب العصبة كان كالآتي :

لما كان المجلس مكلفا بالنظر في القضية الخاصة المتعلقة بإلغاء الانتداب المفروض على العراق لذلك قرر المجلس الأمورالتالية:

مادة(1): تسجيل الرأي الذي ابدته لجنة الانتداب بطلب من المجلس بناء على اقتراح الحكومة البريطانية.

مادة(2): اعتماد المعلومات المتيسرة كافة للدلالة على ان العراق بوجه الاجمال قد استوفى الشروجط الحقيقية المذكورة في ذيل القرار الذي اتخذه المجلس في 4 ايلول سنة 1931.

مادة(3): التصريح باستعداده مبدئيا للحكم بانقضاء عهد الانتداب في العراق، عندما تتعهد هذه الدولة امام المجلس بعهود تنطبق على التوصيات الواردة في تقرير اللجنة الدائمة للانتدابات، مع العلم بان

---

أنسحاب بريطانيا من العراق تتلاشى الحكومة العراقية خلال أشهر، او تبقى بشكل بائس في شريط حدودي بين السامراء والكوت، بينما تنشق المناطق الأخرى)) ، وأيد (ملك فيصل) ذلك بأكثر منه .

ب ـ لم يشر التقرير الى محاولات فصل الجنوب وولاية البصرة وكوردستان من العراق المقترح. ومجموعه أخرى من مشاكل الداخلية.

ج ـ ولم يعطي التقرير المذكور أرقام وأحصائيات حقيقية حول تحريم الشيعة والكورد من الحكم، هكذا بقيت الدولة العراقية حتى عام (2003م) ولم يسلم اي كوردياً ولا شيعياً منصب رئيس الجمهورية، بينما يشكل الكورد والشيعة اكثر من 75٪ من سكان العراق.

د ـ وبدورها تجاهلت عصبة الأمم توصيات لجنتها التي شكلت من أجل مشكلة ولاية الموصل عام 1924 حيث أوصت ببقاء مدة الأنتداب 25 سنة فيه ، بسبب عدم أهلية الدولة في العراق ، كذلك تجاهلت العصبة شروط العضوية (لاسيما الجانب القانونى) فيها.

ع ـ منذ تكوين هذه الدولة إنعدم الأستقرار فيها، ولم يتطرق التقرير البريطاني الى ذلك، والعصبة بدورها تجاهلت التعهدات العشر التي أخذتها من الدولة العراقية، حيث خرق معظم موادها من قبل العراق.

ومآخذ أخرى كثيرة من التقرير...

حق التقاضي الى محكمة العدل الدولية الدائمة منحصر في الاعضاء الذين لهم ممثلون في مجلس العصبة.

مادة(4): لذلك يطلب المجلس الى مقرريه لمسائل الاقليات والقانون الدولي والانتدابات وممثل بريطانيا العظمى في المجلس ان يهيئوا )باستشارة ممثل الحكومة العراقية) وعند الاقتضاء باستشارة ممثلي اللجنة الدائمة للانتدابات، لائحة تصريح تتناول شتى الضمانات الموصى بها في تقرير اللجنة الدائمة للانتدابات، وعرض تلك اللائحة على المجلس في دورته التالية.

مادة(5): انه اذا حكم المجلس (بعد فحص العهود التي تقطعها الحكومة العراقية) بتقلص ظل الانتداب عن العراق، ينفذ هذا الحكم ابتداء من تاريخ انضمام العراق الى عصبة الامم لا غير.

بناء على مادة (4): من قرار العصبة (أعلاه) شكل العراق في 19 /مايس/ 1932 لجنة مكونه من (داود حيدرى، غياث الدين نقشبندي، عبدالجبار تكرلي) لكتابة التعهدات العراقية كشرط مسبق لنيل العضوية ... على هذا الأساس عدت التعهدات العراقية للعصبة (أدناه) دولية:

.التعهدات العراقية –شروط قبول العراق فى (عصبة الأمم)عام 1932

تصريح يتضمن تعهدات العراق إلى عصبة الأمم كما وضعتها اللجنة التي ألفها المجلس المذكور بقراره في 28 كانون الثاني 1932. كتب في بغداد في الثلاثين من مايس 1932

المادة الأولى:

يعترف بالشروط الواردة في هذا الفصل كقوانين أساسية في العراق, فلا يجوز آن يناقض هذه الشروط أو يعارضها أي قانون, أو عمل رسمي, كما انه لا يجوز أن يتغلب عليها أي قانون اوعمل رسمي لا الآن آو في المستقبل.

المادة الثانية:

1. يمنح جميع سكان العراق حماية الحياة والحرية, حماية تامة وكاملة, من غير تمييز بسبب المولد أو الجنسية أو اللغة أو العنصر أو الدين.

2. يكون لجميع سكان العراق الحق في أن يمارسوا بحرية في الأماكن العامة أو الخاصة, شعائر كل إيمان أو دين أو عقيدة, مما لا يكون منافيا للنظام العام و الأخلاق الحسنة.

المادة الثالثة:

يعتبر جميع الرعايا العثمانيين المقيمين في العراق في تاريخ 6 آب 1924 انهم اكتسبوا في ذلك التاريخ الجنسية العراقية دون الجنسية العثمانية, وفقا للمادة 30 من معاهدة الصلح المعقودة في لوزان, وبموجب الشروط الموضوعة في قانون الجنسية العراقية المؤرخ 9 تشرين الأول 1924.

المادة الرابعة:

1. يكون جميع الرعايا العراقيين متساوين أمام القانون, ويتمتعون بعين الحقوق المدنية والسياسية, من دون تميز في العنصر, أو اللغة, أو الدين.

2. يتضمن نظام الانتخابات تمثيلا عادلا للأقليات العنصرية, والدينية, واللغوية, في العراق.

3. الاختلاف في العنصر, أو الدين, لا يخل بحق أي من الرعايا العراقيين في التمتع بالحقوق المدنية, والسياسية, كالقبول في الوظائف العامة, والمناصب, ورتب الشرف, أو ممارسة المهن والصناعات المختلفة.

4. لا يوضع قيد ما على حرية استعمال أي من الرعايا العراقيين لآية لغة في العلاقات الخصوصية, أو في التجارة, أو في أمور الدين, أو في الصحافة, أو النشريات, من جميع الأنواع, أو في الاجتماعات العامة.

5. رغما من جعل الحكومة العراقية اللغة العربية لغة رسمية, ورغما عن التدابير الخاصة التي ستتخذها الحكومة العراقية بشأن استعمال اللغتين: الكردية والتركية, تلك التدابير المنصوص عليها في المادة التاسعة من هذا التصريح, يعطي الرعايا العراقيون الذين لغتهم غير اللغة الرسمية, تسهيلات مناسبة لاستعمال لغتهم شفهيا وكتابة أمام المحاكم.

المادة الخامسة:

الرعايا العراقيون الذين ينتمون إلى أقليات عنصرية آو دينية أو لغوية, يتمتعون قانونا وفعلا بنفس المعاملة و اللامان اللذين يتمتع بهما سائر الرعايا العراقيين. ويكون لهم بوجه خاص نفس الحق في أن يحفظوا ويديروا ويراقبوا على نفقتهم, أو أن يؤسسوا في المستقبل, معاهد خيرية أو دينية أو اجتماعية, ومدارس, وغير ذلك من المؤسسات التهذيبية مع حق استعمال لغتهم الخاصة, وممارسة دينهم فيها بحرية.

المادة السادسة:

توافق الحكومات العراقية على أن تتخذ بحق الأقليات, غير المسلمة, فيما يتعلق بقانونها العائلي, وأحوالها الشخصية, كل التدابير التي تسمح بتنظيم هذه الأمور, وفقا لعادات وعرف الطوائف التي تنتمي إليها هذه الأقليات.

توافي الحكومة العراقية مجلس عصبة الأمم بمعلومات عن الطريقة التي تم بها تنفيذ هذه التدابير.

المادة السابعة:

1. تتعهد الحكومة العراقية بأن تمنح الحماية, والتسهيلات,والرخصة التامة, إلى الكنائس ومعابد اليهود( التوراة) و المقابر, والمؤسسات الدينية الأخرى, و الأعمال الخيرية, والأوقاف العائدة إلى طوائف الأقليات الدينية في العراق.

2. يكون لجميع هذه الطوائف الحق بأن تؤسس, في المناطق الإدارية المهمة , مجالس لها صلاحية إدارة الأوقاف , والهبات الخيرية, ويكون لهذه المجالس سلطة معالجة جباية الواردات الناتجة من تلك الأوقاف, والهبات, و إنفاقها وفقا لرغائب الواقف, أو الواهب,أو للعادة المستقرة بين الطائفة, ويجب أن تقوم هذه الطوائف بمراقبة أموال الأيتام وفقا للقانون. توضع هذه المجالس تحت إشراف الحكومة.

3. لن ترفض الحكومة العراقية, من أجل تأسيس معاهد دينية أو خيرية جديدة, أية من التسهيلات الضرورية, التي تضمن للمعاهد الموجودة الآن, من ذلك النوع.

المادة الثامنة:

1. تمنح الحكومة العراقية, فيما يتعلق بالتعليم العام في المدن والمناطق, التي يقيم فيها قسم كبير من الرعايا العراقيين, الذين لغتهم غير اللغة الرسمية, تسهيلات مناسبة من أجل تلقين العلم في المدارس الابتدائية, إلى أولاد هؤلاء الرعايا العراقيين, بلغتهم الخاصة, ولا يمنع هذا الشرط الحكومة العراقية من أجل تعليم اللغة العربية في المدارس المذكورة إجبارياُ.

2. في المدن والجهات التي يكون فيها قسم كبير من الرعايا العراقيين,ممن ينتمون إلى الأقليات العنصرية, أو الدينية, أو اللغوية, يؤمن لهذه الأقليات نصيب عادل من حيث التمتع بما يرصد من الأموال العامة, بموجب ميزانية الدولة, أو البلديات, أو غيرها من الميزانيات, للمقاصد التهذيبية أو الخيرية, ومن حيث استعمال الأموال المذكورة.

المادة التاسعة:

1. توافق الحكومة العراقية على أن تكون اللغة الرسمية في ألأقضية التي يسود فيها العنصر الكردي, من ألوية الموصل و أربيل و كركوك و السليمانية, اللغة الكردية بجانب اللغة العربية. أما في قضائي كفري و كركوك من لواء كركوك, حيث قسم كبير من السكان هم من العنصر التركماني, فتكون اللغة الرسمية بجانب اللغة العربية, أما الكردية و أما التركية.

2. توافق الحكومة العراقية على أن الموظفين في ألأقضية المذكورة يجب أن يكونوا, ما لم يكن هناك أسباب وجيهة, واقفين على اللغة الكوردية أو اللغة التركية, حسبما تقتضي الحال.

3. إن مقياس انتفاء الموظفين للاقضية المذكورة وان كان الكفاءة ومعروفة اللغة قبل العنصر, كما هي الحال إلى الآن , وعلى قدر الإمكان من بين الرعايا العراقيين الذين أصلهم من تلك الأقضية.

المادة العاشرة:

إن الشروط الواردة في المواد المتقدمة من هذا التصريح, تشكل بقدر ما لها مساس بالأشخاص المنتمين إلى الأقليات العنصرية, أو الدينية, أو اللغوية, تعهدات ذات شأن دولي, وتوضع تحت ضمانة جمعية الأمم, ولا يجري أي تعديل فيها إلا بموافقة أكثرية مجلس عصبة الأمم.

اما قسم الثانى من التعهدات(مكون من 6 مادة) متخصصة لأمور خارجية ، التعهد رقم:13 تؤكد على ان يلتزم بالاتفاقيات الدولية اما فى مادة الأخيرة فيها إلزام العراق بهذه التعهدات وإليكم محتواها:

المادة السادسة عشرة:

...أحكام هذا الفصل يشكل الإلتزامات على العاتق الدولي . ..لا يجوز تعديل هذه الإلتزامات الا بالاتفاق بين العراق ومجلس عصبة الأمم بتصويت الأغلبية .أي اختلاف فيما يتعلق بتفسير أو تنفيذ الأحكام المذكورة ، أن تقدم قرار الى المحكمة العدل الدولي.

الموقعون أدناه ، لهم سلطة مطلقة نيابة عن دولهة العراق ، ويجري الإعلان المنصوص عليها في قرار مجلس عصبة الأمم من 19 مايس 1932.

، نسخة واحدة تودع في ارشيف الأمانة العامة لعصبة الأمم.

توقيع:

نوري سعيد ، رئيس وزراء العراق

(Signed) NOURY SA'ID, *Prime Minister of Iraq*

بەڵام بەو دۆخەی کە کوردستان وەك هەرێم بتوێتەوە لەناو عێراقدا بەو بەڵێنانە چارەسەر نەدەبوو وەك نەبوو، چاکترینیان ئەو پێشنیارەی لیژنەی نێوپژی ویلایەتی موسلی (عصبة الأمم) بوو داوای کرد ئەگەر فاکتەری ڕەگەزی بنچینە بێ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە ئەوا هەق وایە حکومەتێکی کوردی لێ دروست بکرێ[799]، ئەگەر ئەوەش ناکەن دەوڵەتی عێراقی لەو ئاستە نیە میللەتێکی تری

---

[799]ـ تقرير ولاية موصل ص10 بەلام لەراپۆرتە ئەسلیەکەی ص154ة .

بخرێتە ژێر بەرپرسیاری، بۆیە پێشنیاریان کرد کە عێراق بۆ ماوەی 25 ساڵ لەژێر ئینتدابی (عصبەالامم) بمێنێتەوە[800]. تا ئەو ساتەش لە چوارچێوەی عێراقدا ئەو پێشنیارە لە هەموی باشترە کە دەوڵەتێك بێت سەربەخۆیی تەواوی نەبێ سوپا و مەرکەزیەتی نەبێ مولکی(مەحمیە ـ لە ژێر ویسایە)ی نەتەوە یەکگرتوەکان بێت.

عیراق: لە میژوودا پیش 1920 هیچ کیانیکی سیاسی بە ناوی عیراق دروست نەبوە ، لەسەردەمی عوسمانی عیراق ویلایەتیش نەبوو ، لەبەر نەبوونی ناوێکی بەناوبانگ لە سیڤەر و سان ریمۆ وشەی میزۆپۆتامیای عەرەبی بەکارهات بۆ ناوچەکانی خوارووی بەغدا، بۆ یەکەم جار وشەی عێراق (2) جار لەمادەی (3)ی لۆزان بە کار هاتووە[801].

دەولەتی عیراق بە بڕیاڕی بەریتانیا دروست کرا ، بە پی مادەی (1)ی سایکس پیکۆ و دوای بە پێی ماددەی (94) سیڤەر دروست بوە بە مەرجی ئینتداب ، دەقی بڕیاڕەکە: هەریەکە لە سوریا و میزۆپۆتامیا و بەشێوەیەکی کاتی دەبنە ولاتی سەربەخۆ بە پێی ماددەی (22)ی بەشی یەکەمی (میساقی کۆمەلەی گەلان) دەکەونە ژێر راوێژی ولاتانی ئینتداب کراو بەسەریان هەتا ئەوکاتەی دەتوانن لەسەر پێی خۆیان بوەستن.

بۆ ئەو مەبەستەش لەدوای 15 رۆژی تر لیژنەیەکی سێ قۆڵی (بەریتانی، فەرەنسی، ئیتاڵی) و ئەندامێکی عوسمانیش پێك دەهێنرێت، بۆ بەدواداچوونی ئەو سنورانەی لە ماددەی (27)ی سیڤەر هاتوون بەجۆرێك بۆ دەستنیشانکردنی سنوری سوریا نوێنەرێکی ئەوان بەشدار دەبێت بۆ سنوری میزۆپۆتامیاش نوێنەرێکیان ئامادە دەبێت، بڕیاردان لەسەر سنوری تری ئەو دەوڵەتانە و دیارکردنی و هەڵبژاردنی جۆری ئینتداب لە ئەستۆی هاوپەیمانە سەرەکیەکانی دەبێ .

---

[800] ـ دوو جار ئەو پێشنیارە لەڕاپۆرتی ویلایەتی موسل هاتوە ـ تقریر ولایە موصل ص220

[801] بروانە دەقی ریکەوتنامەی لۆزان بە ئینگلیزی هەیە.

تەنانەت لائیحەکەی ئینتدابیش هەرلەلای بریتانیەوە دارژرا ، لە نامەکانی مس بیل زیاتر ئەو بۆچوونە پتەو تردەکا کە دەڵێ: (أسهمت في ربيع 1919 بوضع مسودة صك الإنتداب على العراق مع الدكتور هوكارت ولورانس بموافقة وكيل الحاكم الملكي العام) لەنامەیەکی تری ڕۆژی 1921/9/25 :(أني سأدير شؤون البلاط حتى يستطيع الوقوف على قدميه)[802]، وای دەردەخا لائیحەکەی ئینتداب بەسەر عیراق خۆیان دایان ڕشتوە نەك یاساناسانی عوسبە ،بە پێی مادەی 12 ی ئینتداب بەریتانیا کارو باری دەرەوەی عیراقی بەڕێوە دەبرد ،بۆیە حکومەتی عیراق وەزیری دەرەوەی نەبوو ،بە پێی مادەی 17 دەبوو بریتانیا راپۆرت بۆ کۆمەلەی گەلان بنیری بزانری چەندە نزیك بوە لە فێرە دەولەت بوون ، بریتانیا بە فەرمی عیراقی ئاگادار کردەوە بە نوسراوی ژ: 525/237 لە ڕۆژی 1929/9/14 کە ئامادەیە بیخاتە نیو کۆمەلەی گەلان لەسالی 1932، کۆمەلەی گەلانیش لە 14ی کانونی یەکەمی 1931 لیژنەیەکی پیکهینا بۆ وەرگرتنی عیراق ، پەرەگرافی (2)ی مادەی یەکی میساقی کۆمەلەی گەلان تایبەت بوو بەمەرجەکانی وەرگتنی ئەندامیەتی ، دوولەسەر سێی ئەندامانی ئەنجومەنیش دەبێ رازی بن ،دوای کۆمەلەی گەلان داوای بەلیننامەی لە عیراق کردو تاپابەند بیت ئینجا وەرگیرا ،عیراق 16 بەلینامەی دا ،10ی یەکەمی سەبارەت بە ناوەخۆ بوو(لەسەروو دەقەکەی هەیە) .بەو شێوەیە عیراق لە سالی 1932 بوە ئەندامی کۆمەلەی گەلان .

بەریتانیا خۆی تەواوی دام ودەزگاکانی دەولەتی عیراقی دروست کرد ،تەنانەت خودی عیراقیش یەکەم جار سنوری بۆ دیاری کرد دوای حکومەت وئینجا سوپاو ،مەلیکیکی لە حیجاز بۆ هێنا ، دوای پەرلەمان ودەستورو باقی دام ودەزگاکانی بۆ دروست کردو لە سالی 1932 بەفەرمی کردیە ئەندامی کۆمەلەی گەلان .

**سەرەنجامی کۆمەلەی گەلان :**

[802]العراق في رسائل مس بيل ص365

هەر لەسەرەتای دروست بوونی کۆمەلەی گەلان رەخنەی ئەوەهەبوو کە کاری ئەو دەزگایە زیاتر بەرجەستە کردنیکی یاسایی دەسکەوتە بۆ وولاتانی سەرکەوتوو بەتایبەتی بەریتانیا،هەر خودی میساقی کۆمەلەی گەلان لە کۆنگرەی ڤیرسای دیاری کرا، میژوونوسی گەورەی ئەمریکی ( گاتانو سلفیمینی) لە زانکۆی هارفرد ڕایەکی کاریگەری لەسەر کۆمەلەی گەلان بلاوکردەوەو ووتی (إن تاریخ عصبة الأمم بین الحربین الأولى والثانیة هو تاریخ الغدر، والحیل، والخیانة)[*]، بەتایبەتی سیستەمی ئینتدابی ،لەلایەکی تریش هەر لەسەرەتادا کۆنگریسی ئەمریکی رازی نەبووئەمریکا ببیتە ئەندامی کۆمەلەی گەلان ، تەمەنی کۆمەلەی گەلان بە 3 قۆناغ تێپەڕی قۆناغی بوهاری ،بەرزترین ژمارەی ئەندامانی گەیشتە 60 لەسالی 1932 ،قۆناغی ئارامی وقۆناغی تیکڕووخانی، تائەو قۆناغە چەندین وولات بەخۆیان کشانەوە ، یەکیتی سۆڤیەتی دەرکرا لە 1939/12/14،ئەویش هەلسابە هاوپەیمانی لەگەل ئەلمانیای نازی کە بە(حلف حلف مولوتۆڤ-ریبنترۆپ ) یان( ستالین –هیتلەر) ناوزەد دەکرا، کە لە 24/ئۆگست/1939 گریدرا لە مۆسکۆ، تا 22ی یۆنیۆی 1941 تیکچوو وبوە جەنگی جیهانی نیوانیان ،ژمارەی ئەندام لە سالی 1939 هاتە خوار بۆ44 وولات ،لەو قۆناغە یابان مەنشۆریای داگیر کردو گوێی بە کۆمەلەی گەلان نەدا ،سەرەڕای ئەوەش وەك نارەزایی بەرامبەر هەلویستی کۆمەلەی گەلان لەمەڕ مەنشۆریا یابان لە 1939/3/27 لەکۆمەلەی گەلان کشایەوە ،بە هەمان شیوە ئیتالیا حەبەشەی داگیر کرد،هتلەریش جەنگی جیهانی ڕاگەیان کۆتایی بەوکۆمەلە هێنا ،دوا دانیشتنی کۆمەلەی گەلان لە 1946/4/18 گرێدرا وبڕیارِ درا هەمو دۆسیەکانی کۆمەلەی گەلان بگوازرێتەوە بۆ نەتەوە یەککگرتوەکان .

سەرنج: نەتەوە یەککگرتوەکان لە بەشی یەکەمی مەوسوعەی جودی هەیە .

---

[*] سنایدر - العالم في القرن العشرین ص 135.

## (26)

# سیستەمی ئینتداب نظام الانتدابی Mandatory system

**ئەوانەش دەگریتەوە( ویسایە،مەحمیە، مبدأ ملتون ، دام ودەزگای فەرەنسی لە رۆژهەلاتی – Etablissements français du Levant)،ئینتداب (أ)،ئینتداب (ب)،ئینتداب (ج)، المملكه التی لاتغیب عنها الشمس) .**

فلسفەی ئینتداب_ گوزارش لە بیریکی قوولی رۆژئاوا دەکات بەرامبەر میلەتانی کیشوەرەکانی ترو ئاری بەرامبەر (نائاری)، قوول دەبیتەوە بۆ تیفکرینەکانی یۆنانی کۆن کە پێیان وابوو مرۆڤی ئەوروپی لە قورو زێرِدروست کراوە ،کەچی میلەتانی تر لە قورو تەنەکە دروست کراوە ،بۆیە خۆیان پێ شارستانی بوو خەلکی تریش بەربەرو ئیسنی ونەژادی دوەم، بەو شیوە ئەوان بۆ سەرکردایەتی وفەرمان و خەلکی تریش بۆ بەدواکەوتن وپابەندی ،لەسەردەمی داگیرکاری میسرلەلایەن ناپلیۆن شێوازیکی وای پەیرەو کرد ئەگەر ئەو ناوەشی نەبووبێ هەلسا بە ریکخستنی ئەنجومەن لەهەموناوچەکان وسەرۆکی لە شیخ وکەسایەتی بۆدیاری کردن بۆ هەر ئەنجومەنیك راویژکاریکی فرنسی یاوەریان بێت بۆ ئیدارەدان[804] ،ئەوەش بەرجەستە بوو لە بنەمای (میلتۆن) کە ئەوان مامۆستاوخەلکی تر قوتابی بۆ فیرە ژیان ودەولەت داری ، ئەو بۆچوونە ئەگەر چی بنچینەیەکی سروشتی نیە کەچی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918) بە واقعی دەرکەوت، ئەوان پیشکەوتو وئامادە وخەلکی تریش بەتایبەتی میلەتانی عەرەب زۆر دواکەوتو ،لەوەوە بیرۆکەی سیستەمی ئینتداب هاتە کایەوە لەلایەن فرنساو بریتانیا و وولاتانی تری سەرکەوتوو لەجەنگ، یەکەم جار جنرال سمتیس(1870-1950) ئەوبیروکەی لەگەل بیروکەی داهینانی (عصبە الامم)جارِدا لە نامیلکەیەکی سادە ،هەرچی فۆرستەرە دەلێ ئەوە بیرۆکەیەکی کۆنی ئەمریکیە بۆ سالی 1878ز دەگەرِیتەوە ،مسیۆ پیشۆ دەلێ ئینتداب لەگەل ریکەوتنامەی سایکس پیکۆ

---

[804] بۆ ئەو سەربردەیە برِوانە : مانسفیلد – تاریخ الشرق الاوسط ص84

داڕژرا[805] ، كه هەر وولاتیكی مەزن لەوانە كۆمەلیك میلەت لە ئەستۆ بگرن وفێری دەولەتداریان بكەن ، ئەو میلەتانەی لە ژێر دەستی عوسمانی وئەلمانیا بوون ،بۆ ئەو مەبەستەش لە1919ز ئەو سیستەمە ڕەوایی پیێ درا لەدوای جاڕدانی بنەمای ویلسن كە بۆ ڕزگاری میللەتان پەیدابوو، لە ریكەوتنامەیسانریمۆ 1920 و ئینجا لە (عهدی عوسبەت ئومەم-مادەی 22) تۆماركران ،تاڕادەیەكی زۆریش ڕاستگۆ دەرچوون فێریان كردن و بوونە دەولەت ،دەولەتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەو سیستەمە وەبەرهێنراون، بەو شێوەیە سیستەمی ئینتداب لەگەل سیستەمی ئیستعماری لێكجیا بوەو لەگەل سیستەمی وەبەرهێنانی (موستوتەنات)یش جیا بوو ،بە پێچەوانەی ئەو ناووناتۆرەی لەسەرەتا بۆی داتاشرا وادەرنەچوو ،چۆنیان بەلێن دا ئاوایان جیبەجیێ كرد لە ریكەوتنامەی سیڤەر ، لەكۆتاییدا زۆربەیان بوونە دەولەتی سەربەخۆ ،ئەو پرۆسەیە لە سەرەتای داگیركردنی و دروست كردنی دام ودەزگای دەولەت بۆ ئەو میلەتانە تا ئەو رۆژەی دەبوونە ئەندام لە عوسبەت ئومەم ئەو پێی ووتراوە (ئینتداب) ، بەو نێوانەی دروست كردنی دام ودەزگای دەولەت بوون دەووترا ( فترە الإنتداب ).

بەلاّم گەلیێ جار لەلایەن ڕەخنەگرانەوە وادەبینرا كە ئەوەش هەر جۆرێكی ترە لە داگیركردنی ئینتیدابی و گۆڕینی شێوازی ئیمپریالیزمیە، بەتایبەتی كە ماوەی ئینتیدابی درێژەی دەكێشا، لە نامەكانی مس بیل زیاتر ئەو بۆچوونە پتەو تر دەبوو كە دەلیێ: (أسهمت في ربیع 1919 بوضع مسودة صك الإنتداب علی العراق مع الدكتور هوكارت ولورانس بموافقة وكيل الحاكم الملكي العام) لەنامەیەكی تری رۆژی 1921/9/25 :((أني سأدير شؤون البلاط حتی يستطيع الوقوف علی قدميه))[806] ، وای دەردەخا لائیحەكەی ئینتداب بەسەر عیراق خۆیان دایان ڕشتوە نەك یاساناسانی

---

[805] فورستر– نشأة الدولة العراقية ج1ص10، و ص88 وص85

[806] العراق في رسائل مس بيل ص365

عوسبه ، بۆزیاتر تیگەیشتن لە سروشتی یاسایی ئەو سیستەمە ئەوەی خواروە نمونەی لائیحەی سیستەمی ئینتدابی عیراقە[807] :

---

[807] بناء على نص المادة (132) من معاهدة الصلح، الموقع عليها في (سيفر)، في اليوم العاشر من شهر أغسطس سنة 1920، التي بموجبها تنازلت تركية عن كل حقوقها وتملكها في العراق، إلى الدول المتحالفة الرئيسية" وبناء على المادة (94) من تلك المعاهدة، التي بموجبها قررت هذه الدول الكبرى، وفقاً للفقرة الرابعة من المادة (22)، من الفصل الأول (عهد جمعية الأمم)، بأن تعترف بالعراق دولة مستقلة، يشترط عليها قبول المشورة الإدارية والمساعدة من قبل منتدب، إلى أن تصبح قادرة على القيام بنفسها وحدها" وإن تحديد تخوم العراق، سوى ما هو مقرر في المعاهدة المذكورة، واختيار المنتدب، تتفق عليه الدول الرئيسية المتحالفة" وبما أن الدول المتحالفة الرئيسية قد اختارت صاحب الجلالة البريطانية، منتدباً من قبلها على العراق، وبما أن شروط الانتداب الآتي ذكرها، رفعت إلى مجلس جمعية الأمم، للمصادقة عليها، وبما أن صاحب الجلالة البريطانية، قد قبل أن يكون منتدباً على البلاد المذكورة، وتعهد بذلك، بالنيابة عن جمعية الأمم، طبقاً للمواد الآتية لجمعية الأمم ـ توافق على شروط هذا الانتداب، كما يلي:

**المادة الأولى:** للمنتدب أن يضع، في أقرب وقت، لا يتجاوز ثلاث سنين من تاريخ تنفيذ الانتداب، قانوناً أساسياً للعراق، يعرض على مجلس جمعية الأمم، للمصادقة" فينشره سريعاً. وهذا القانون، يسن بمشورة الحكومة الوطنية، ويبين حقوق الأهالي الساكنين ضمن البلاد ومنافعهم ورغائبهم، ويحتوي على مواد تسهل تدرج العراق وترقيته، كدولة مستقلة. وفي الفترة، قبل العمل بالقانون الأساسي، تجري إدارة العراق طبقاً لروح الانتداب.

**المادة الثانية:** يحق للمنتدب أن يحفظ قوة عسكرية في البلاد، الواقعة ضمن هذا الانتداب، لأجل الدفاع عنها. وإلى أن ينفذ القانون الأساسي، ويوطد الأمن العام، له أن يؤلف جيشاً محلياً، لتأييد الأمن والدفاع عن البلاد، يجنده من الأهالي القاطنين في البلاد. ويكون هذا الجيش مسؤولاً لدى الحكومة المحلية، وخاضعاً دائماً للمشارفة (للسلطة)، التي يتولاها المنتدب على هذا الجيش. ولا يجوز للحكومة العراقية، أن تستخدم هذا الجيش في سبيل آخر، غير ما ذكر سابقاً، إلاّ بموافقة المنتدب. ولا يحول شيء بما هو مذكور في هذه المادة ومن اشتراك الحكومة المحلية في مصرف أي جيش كان يقيمه المنتدب على العراق. ويحق للمنتدب، في كل وقت، استعمال الطرق والسكك الحديدية والمراسي في العراق، لتحريك القوات المسلحة، ونقل الوقود والأرزاق.

**المادة الثالثة:** يفوض المنتدب بإدارة علائق العراق الخارجية، وبالحق بإصدار التفويض للقناصل، الذين تعينهم الدول الأجنبية فيه. وكذلك، يكون له الحق بفرض الحماية، السياسية والقنصلية، على رعايا العراق في البلدان الأجنبية.

**المادة الرابعة**على المنتدب تبعة الاحتفاظ بالأراضي العراقية. فلا يتنازل عنها، ولا تؤجر، ولا توضع تحت سلطة دولة أجنبية.

**المادة الخامسة:** يلغى بتاتاً، في العراق، إعفاء الأجانب وامتيازاتهم في المصالح الناتجة عن المحاكم، القنصلية والجنائية، التي كانوا يتمتعون بها، نظاماً أو عرفاً، في السلطنة العثمانية.

**المادة السادسة:** تكون الدولة المنتدبة مسؤولة عن إيجاد نظام قضائي في العراق، يضمن: 1. مصالح الأجانب. 2. والقوانين ـ ولحد ما يرى أنه من المناسب ـ الاختصاص القضائي القائم الآن فعلاً في العراق، فيما يتعلق ببعض المعتقدات الدينية، كأحكام الوقف والأحوال الشخصية. وتوافق الدولة المنتدبة، على الأخص، بأن تكون السيطرة على الأوقاف وإدارتها جارية طبقاً للشريعة وإرادة الواقفين.

**المادة السابعة:** ريثما تعقد معاهدات خاصة مع الدول الأجنبية، فيما يمس العراق، من تسليم المجرمين الفارين إليه، يعمل بالمعاهدات الحاضرة بين المنتدبين والدول الأجنبية.

**المادة الثامنة:** يؤمن المنتدب للجميع حرية الوجدان التامة، وحرية العبادات، في كل هيئاتها وأشكالها، بشروط ألاّ يخل ذلك بالأمن العام والآداب. ولا تميز فئة على أخرى في العراق، بسبب جنسية أو دين أو لغة. والمنتدب يسجل التعليم بلغات العراق الوطنية، ولا ينكر على فئة حقها، ولا تضار في تأييد مدارسها الخاصة بتعليم أبنائها لغتها الخاصة، على شرط انطباق ذلك على مقتضيات التعليم، التي ترسمها الحكومة.

**المادة التاسعة:** لا يجوز أن يؤول شئ بما ذكر في هذا الانتداب، لأنه يمنح المنتدب حق التدخل في مباني أو إدارة العتبات المقدسة، التي تبقى صيانتها مكفولة.

**المادة العاشرة:** على المنتدب أن يراقب أعمال المبشرين في العراق، حسبما تقتضيه الحالة، لتوطيد الأمن العام، وحسن إدارة الحكومة. وفيما سوى ذلك، لا تؤخذ وسيلة ما من الوسائل، لمعارضة تلك الأمور والمداخلة فيه" ولا تميز فرقة على أخرى، بسبب مذهب أو جنسية.

**المادة الحادية عشرة:** على المنتدب أن يمنع، في العراق، التمييز بين رعايا أية دولة أخرى، في كل ما هو متعلق بالضرائب والتجارة والصناعة والفنون، أو في معاملة السفن التجارية والطيران الملكي. وكذلك، لا يكون تمييز، في العراق، بين البضائع الصادرة عنه إلى أية دولة، أو الواردة إليه منها. وتكون حرية النقل تامة في كل البلاد، بشروط عادلة. وفيما سوى هذا، فللحكومة العراقية الحق ـ بعد استشارة المنتدب، أن تضرب الضرائب والرسوم الجمركية، كما تقتضي، وأن تتخذ أحسن الوسائل لاستثمار موارد البلاد الطبيعية، وتأمين منافع الأهالي. ولا يحول شيء بما في هذه المادة، دون حق الحكومة العراقية، بعد مشورة المنتدب، بعقد وفاق جمركي مع أية دولة، كانت كلها، في سنة 1914 ميلادية، داخلة في تركيا الآسيوية، أو جزيرة العرب.

**المادة الثانية عشرة:** يوافق المنتدب، بالنيابة عن العراق، على المعاهدات الأممية، المتبعة الآن، أو التي يصير عقدها فيما بعد، بمصادقة جمعية الأمم، في كل ما هو متعلق بالنخاسة، أو تجارة الأسلحة، أو العقاقير المخدرة، أو للمساواة التجارية، أو حرية النقل للملاحة الجوية والسكك الحديدية والبريد والبرق واللاسلكي، والملكيات الفنية والأدبية والصناعية.

**المادة الثالثة عشرة:** يضمن المنتدب مؤازرة الحكومة العراقية، ما سمحت له الأحوال، الدينية والاجتماعية، على تنفيذ السياسة العامة، التي تتخذها جمعية الأمم، لمنع الأمراض ومحاربتها، شاملاً ذلك أمراض النبات والحيوان.

**المادة الرابعة عشرة:** يضمن المنتدب، في أثناء اثني عشر شهراً من تاريخ العمل بهذا الانتداب، أن يسن نظاماً للآثار العتيقة، ويجري بموجبه، طبقاً على ما في المادة (421) من الفصل الثالث عشر، من المعاهدة التركية، عوضاً عن نظام الأثريات التركي. ويكفل المساواة في كل ما له مساس بالتحريات الأثرية، بين كل رعايا الدول، التي هي أعضاء في جمعية الأمم.

**المادة الخامسة عشرة:** عدما ينفذ القانون الأساسي، يعقد اتفاق بين المنتدب والحكومة العراقية، على الشروط، التي بموجبها تتسلم الأخيرة الأعمال العمومية، والأشغال الدائمة، التي يرجع منافعها إلى الحكومة العراقية. ويعرض هذا الاتفاق على مجلس جمعية الأمم.

**المادة السادسة عشرة:** لا شيء مما في هذا الانتداب، يمنع المنتدب من تأسيس حكومة مستقلة إدارياً، في المقاطعات الكردية، كما يلوح له ...

**المادة السابعة عشرة:** يرفع المنتدب، كل سنة، إلى مجلس جمعية الأمم، بياناً بالأعمال المتخذة في تلك السنة، لتنفيذ الانتداب، ويرفقه بنسخ من كل الأنظمة والأوامر، الصادرة في تلك المدة.

**المادة الثامنة عشرة:**يقتضي رضا مجلس جمعية الأمم، لتعديل شروط هذا الانتداب، على شرط أنه إذا اقترح المنتدب تحويراً، يكفي للعمل به، أن ينال رضا أكثرية المجلس.

**المادة التاسعة عشرة:** إذا وقع اختلاف بين أعضاء جمعية الأمم، على تأويل أو إجراء مواد هذا الانتداب، ولم يمكن تسويته بالمفاوضات، فيرفع إلى محكمة العدل الدولية الدائمة، المذكورة في المادة (14) من عهد جمعية الأمم.

**<u>میلەتانی ژێر ئینتداب:</u>** مەبەستە گەورەکەی وولاتانی رۆژئاوا ئەوەبوو چیتر ناوچەیەك نەمینیت بیبەرپرسیاریەتی بەرامبەر دام ودەزگا نیودەولەتیەکان ،لەلایەکی تریش دروست کردنی بازاڕو بازرگانی ریکخراو لەگەل ئەو وولاتە تازە پیگەیشتوانە، لەسەر ئەو بنچینەیە کۆمەلیك کۆنگرەو ریکەوتنامەی ئاشکراو نهینی کرا بۆدابەش وچارەی ئەو پرسە ، تویژینەوەی ووردیش بۆ بارودۆخی میلەتانی ناوچەکە کرا ، بنەمای ملتۆن داڕژرا کە دەلیت: ((لا تدع بريطانيا تنسى رسالتها في تعليم الأمم كيف تعيش))[808] ، کە لە پەرەگرافی (4) ودیباجەی ماددەی (22)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە یاسایی کراو وەسفیان دەکات و دەڵێت: میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەولەت، بەپێی فەرهەنگی داگیرکەر وسیستەمی ئینتداب لەلایەن (عوسبە)دەرچوو لە بڕگەی(3)ی مادەی (22)ی (عەهدی عوسبە) دەقەکەی: ( أن بعض الشعوب التي كانت خاضعة للإمبراطورية العثمانيه قد وصلت إلى درجه من التقدم يمكن معها الاعتراف مؤقتا بكيانها كأمم مستقلة خاضعة لقبول الإرشاد الإداري والمساعده من قبل الدولة المنتدبة، إلى ذلك الوقت الذي تصبح فيه هذه الشعوب قادرة على النهوض وحدها، ويجب أن يكون لرغبات هذه الشعوب المقام الأول في اختيار الدولة المنتدبة)، سەرجەم سێ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو بۆسیستەمی ئینتداب، بەپێی دواکەوتوویی، گرووپی A: ژێر دەسەلاتی عوسمانی (وەك عێراق و شام وئوردەن و...)بەجۆرێك عیراق و ئوردەن وفلستین بۆ بریتانیا بوو ،شامیش بۆ فرنسا، فرنسا زاراوەی ئینتدابی بەکارنەدەهێنا بەلکو بە(دام ودەزگای فەرەنسی لە رۆژهەلاتی - Etablissements français du Levant) بە کاردەهێنا .

گرووپی B ئەفریقیا پلەی دوەمی هەبووبەو شێوەیە بوو(کامیرون تۆگۆبۆفرنسا، سەرووی رۆژئاوای کامیرون و رواندواو بۆروندی وتۆگۆی رۆژئاوا نگانیگیا بۆ بەریتانیا ، گرووپی C ژێردەستەکانی ئەلمانیا پلەی سێیەمی هەبوو، ئەوانەی دەگرتەوە :خوارووی رۆژئاوای ئەفریق بۆ (إتحاد جنوب إفريقيا

---

**المادة العشرون:** عندما ينتهي الانتداب الممنوح بهذا التصريح، يتخذ مجلس جمعية الأمم التدابير اللازمة، لجعل الحكومة العراقية، بكفالة الجمعية، تدفع كل المصاريف القانونية، التي صرفها المنتدب، مع حقوق الموظفين بالمكافأة ومعاش التقاعد.

تحفظ هذه النسخة في خزانة جمعية الأمم. ويرسل كاتب سر الجمعية نسخة رسمية إلى كلّ من الدول، الموقعة في معاهدة الصلح مع تركيا.

[808] د على وردى -لمحات... المصدر السابق ج5- ص56 .

)پانتاییەکانی ئۆکیانوسی (سەرووی ئەکواتۆر-تیلمەکانی کارۆلین-ماریان-مارشال)بۆ ژاپۆن ، هەرچی ئەکواتۆری خواروو ونۆرۆ بۆ بەریتانیابوو کەلەلایەن ئوسترالیاوە سەرپەرشتی دەکرا ،غینیای نوێ بۆ ئوسترالیاو سامۆی رۆژئاوا بۆ نیوزلەندا، لەهەموی بەشی بەریتانیا پشکی شێر بوو ،بەو هۆیەوە کۆلۆنیالەکانی بەریتانیا گەیشتە نزیك 8ملیۆن کلم$^{2}$ ،لەدوای یان وەك هەندێ سەرچاوە زیاتر دەلێن چاریەکی جیهان لەدەست بەریتانیا بوو[809] ، پیشی دەووترا (المملكه التى لاتغيب عنها الشمس).

ئینتدابی (C)بۆ میلەتانی ئەفریقابوو کە دواکەوتوو تر بوو، چەمکی ئەیتیما و خاکی بیخاوەن ناوزەد کرابوون ، میلەتەکانیشیان بە (دونیە -inferiority ) وەسف دەکران وەك پاساوی ئینتیداب و خاوەن ئینتداب دەیدا بۆ موستەعمەرە تا وای تیبگەیەنی ئەو لاوازەو ناتوانی گەشە بەخۆی بداو دەولەتی پی دروست نابیت ،مقەوەماتی گەشەی نیە[810] تەنانەت جاریش وابوو بەوانەی پۆلی (C) دەووترا (sub-man - الإنسان الناقص) ، ئەو کاتی ئەو وولاتانەی ئەفریقا کەوتنە ژێر ئینتدابی پلەی(C) کامیرون وتۆگولاندو تنگانیڤیا خوارووی ئەفریقا بۆ بریتانیا، بەشیکی تری کامیرون وتۆگولاندو بۆ فرنسا،رواندا بۆ بلجیکا ، سوریاولبنان بۆ فرنسا ،عیراق وئوردەن وفلستین بۆ بریتانیا ، چەکی ئینتدابەکان بە ناوی بەرەو ئۆتۆنۆمی هاتبوون ڕاستەوخۆ وەك مادەی (3) ئینتدابی بەریتانی بەسەر فلستین[811] یان ناڕاستەوخۆ لەوانی تر، بەلاّم ئەو ولاّتانە ئەوانەن کە لەژێر دەستی ولاّتێکی هاوپەیمانی دیاریکراو بوون، دەسەلاّتی ( دەولّەتی منتدب)زیاتر بووە لە کاروبار هەلّسوڕانی .. ناوەڕۆکەکەی بە پوختەیی ئەوەیە ولاّتانی دەسەلاّتداری مەزن هەلّسێ بە پێی فەرمانی یاسای نێو دەولی یارمەتی میلەتێکی پێنەگەشتوو بدا تا دام و دەزگای دەولّەتیان بۆ ڕێك دەخا، لە میساقی (کۆمەلّەی نەتەوەکان ـ عصبە الامم)لە مادەی (22)ش هەر واهاتبوو کە سیستەمی ئینتداب دەبێ لەدوای ئینتداب ئۆتۆنۆمی محەلی وەرگرن بۆئەوەی لە داهاتوەکی نزیك سەربەخۆ بن، هەروەهاش بۆ

---

[809] د. أمزيان حسين- وحـدة حركات التحررفي العالم- ص48 .

[810] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص210

[811] بروانة دةقى ضةكى ئينتدابى فةلةستين كة لة24/يؤليؤ/1922دةرضوو، 28 مادة بوو.

وەرگرتن وبون بە ئەندام لە(عصبە)سێ پۆلی وەردەگرت موستەعمەرە و دۆمینیۆ و ئەوانەی ئۆتۆنۆمیدارن[812].

ئەو دیزاینە سیاسیە نوێیەی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە پێی سیستەمی ئینتداب دروست بوو تا ڕادەیەك لەگەل دیزاینەکەی سایکس پیکۆ جیابوو ،ئیتالیا تورکیای(ئیستا)ی بەرکەوتبوو ئینتدابی وەرنەگرت ، لەلایەکی تر بەریتانیا و فرنسا هەولیان دا بەشی ئەمریکا دیاری بکەن لە ئەرمینیا، بەڵام دوای ئەمریکا بۆی دەرکەوت ئەوە فێلی لێ دەکەن، دەیانەوێ بیکەنە سەنگەر لەپیش بزوتنەوەی بەلشەفی شیوعی لەسەردەمی لینین و روسیا، ئەمریکا لەدژی ئەوهەنگاوانەی بەریتانی وهاوپەیمانان وەستا، سیاسەتی (باب المفتوح)ی بەرز کردەوەو داوای کرد ئەو وولاتانەی کەوتونە ژیر ئینتدابی بریتانی وفرنسی بە فەرمی بخرینە ژیر مومتەلەکاتی عوسبە ،بۆ ئەو مەبەستەش لەدوای سالی 1919لیژنەی (کنگ ـ کراینی) بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نارد ، بەلام کاری کی وانەکرا بۆیە کۆنگریسی ئەمریکا ڕێی بەحکومەتی ئەمریکا نەدا نەبەشداری ئینتداب بکا نەبەشداری عوسبەتولئومەم .

پەیوەندی بەکوردستان وولاتانی ناوچەکە :

سیستەمی ئینتداب لەسەرەتادا جێی شانازی نەبوو ، چونکە بە ئاشکرا رازی بوون بوو بەوەی کە میلەتێك ببێتە مامۆستای میلەتێکی تر ،کەس ئەوەی قەبوول نەکرد تەنها سەرکردە عەرەبەکان لە جیاتی میلەتانی عرب قەبوولیان کرد ، ئەو وولاتانەی ئیستای عربی لەسەر ئەو بنچینە دروست بووینە ، جگە لە جزائر بەدەست ومستی خۆی ولە ڕێی شۆڕش گەیشتە دەولەت ، وا بەنیاز بوون تورکیاش نەبێتە دەوڵەت، یان ئەگەر بووە دەوڵەتیش بەپێی (ئنتیداب) بێ، بەڵام بەختی تورکیا ئەوەبوو یۆنان بە هێز نەبوو بە ئاسانی مستەفا کەمال یۆنان و ئیتالیای لەو ناوچانە دەرکرد ودەولەتی تورکیای بەسەربڵندانە دروست کرد بێ ئینتداب .

[812]ـ الأمم المتحدة فی نصف القرن ص25

دوای داگیرکردنی بەغدا بەسانایی بریتانیا زۆر بەزەحمەت خشکەی بۆلای باشووری کوردستانیش دەکرد ، وەك لە برووسکەکانی سەرکردەکانی بریتانی بۆ بەرپرسانی سەربازییان ناردووە، داوایان لێکردوون وریا بن زۆر نزیکی ناوچە کوردییەکان نەکەونەوە وەك بنجاپی هندی ناخۆشە، ئەوە لەلایەك سەروەرییە کە کەس بە ئاسانی بوێری نەکا ناوچەکانت داگیر بکا، لێرەدا خەریکە ئەو سەروەرییە دەبێتە دەرد، هۆیەکە بۆ نەهاتنی هیچ هێزێك و بە بۆشایی مانەوەی، لەو سەردەمیش وەك بڕیاری نێو دەوڵەتی بۆ بەدەوڵەتبوون بریتی بوو لە (سیستەمی ئینتداب) کە لە مادەی 22 میساقی (عوسبەت ئەلئومەم) بۆ میراتی عوسمانی دەرچوو ، هەر میللەتێکی ژێر دەستی عوسمانی کە کەوتۆتە ژێر دەستی وڵاتێکی براوە لە جەنگ هەڵسێ بە فێرکردنی ئەو میللەتانەی ژێر دەستیان بۆ دەوڵەت دروستکردن، کاتێ کوردستان بە تەواوی نەکەوتە ژێر دەستی هیچ لەو وڵاتانە ، لەلایەکی تریش وولاتیکی ئەیتیمای بێخاوەن نەبوو ،حکومەتێکی کوردی لە سلێمانی (وەك پایتەخت) سەری هەڵدا بەڕابەرایەتی شێخ مەحمود و عوسمانیش دانی پیاهێنا (بەپێی بروسکەی عەلی ئیحسان پاشا لە 1918/10/30)، دوایی لە (1919 و 1922) بەریتانیاش وەك (حوکمدار) دانی پێدا هێنا ، واتە ئاستی سیاسی ویاسایی کوردستان لەسەروی ئینتداب بوو، کوردستان لەبەر پێگەیشتنی و بوونی دەسەڵاتی سیاسی و هەرێمێکی دیاریکراو بەناوی (کوردستان) سنورەکەی دیاربوو. بێجگە لەفەرهەنگی وڵاتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری وسیاسی عوسمانی کۆن ونوێ، دانیان بەکوردستان نابوو، سنوریشیان دیاری کردبوو، لەکۆنەوە لەلایەن ئۆلیا چەلەبی لە سیاحەتنامە هاتبوو، لەنوێش لە هەردوو نەخشەی سیاسی 1893 و1896 سنوری کوردستان زۆر بەگەورەیی هاتبوو، هەروەها لە فەرهەنگی عوسمانیش لە (قاموس الاعلام)ی شمس الدین سامی لە مادەی: سنوری کوردستان بەووردی دیاری کراوە چەندە گەورەیە، بۆیە ناوی کوردستان لە سیڤەر گوزارشی لە باکگراوندی بەهیزی سەردەمی عوسمانی دەکرد.

ئەوە لەلایەك لەلایەکی تریش وەك لە وەسفەکانی بەریتانی و فەڕەنسی هاتبوو کوردستانیان بە (پەنجام) دەچواند و نەدەوێران هێزەکانیان بنێرنە نێو قولایی شاخ و داخەکان، لەسەر هیچ لایەك ساغ نەدەبۆوە، بۆیە لە سیڤەردا بە هەڵپەسێردراوی مایەوە بۆ ماوەی ساڵێك، هەمو ئەوانەڤوزارشە لە

پیگەیشتن ئەوا پێویستی بە ئینتداب نەبووە، لە سیڤەر زیاتر ئەو ئاستانە دەردەکەویٚ ، لەمادەکانی 94 بەدواوە بۆ عیراق وشام وووڵاتانی عربی دێت باس لە ئینتداب دەکات بەڵام مادەکانی (62-63-64) باسی ئینتدابی تێدا نیە ،بەلکو باس لە ئۆتۆنۆمی وسەربەخۆیی لەماوەی سالێك دەکات ،ئەوەی عیراق بۆماوەیەکی دریژ جاروایە باسی 25 سال کرابوو ، بەڵام لەکۆتایدا ئەو شانازیە بوە مەینەت وئەوانەی بە سەرشۆڕیش ئینتدابیان قەبوول کرد بوونە دەولەت و خاوەنی کوردستانیش .

<u>**سەرەنجامی ئینتداب**</u> : جێی سەرنج بوو هەمو وولاتانی ناوچەکە نەکەوتنە ژێر سیستەمی ئینتداب ،تورکیاو ئەرمینیاو کوردستان ، وولاتانی کەنداویش ئەوەش بۆسیٚ هۆ دەگەڕێتەوە ،1-ئەوانەی سەروو بە تەواوی ساغ نەبوونەوە بۆ هیچ لایەك لە وولاتانی هاوپەیمانی 2- ساغ بوونەوەی وولاتانی کەنداوی پیشووتر تا ڕادەی یەکلابوونەوە بۆ بریتانیاپیویستی بەدابەشی نەکرد 3- وولاتانی ئەرمینیاو تورکیاو کوردستان تاڕادەیەك پیشکەوتوو تر بوون لە وولاتانی تری دەوروبەریان ،بۆیەش لە ریکەوتنامەی سیڤەر سەربەخۆییەکانیان بەند نەکرابوو بە ئینتدابەوە ،ئەوەش بە ڕاشکاوانە تر لە مادەی ( 64)کە دەلیٚ ئەگەر زانیان حوکمی خۆیان پێدەکریٚ ئەوە دەبیٚ تورکیا دانیان پێبهێنیٚ[813] ،ئەوانەی کەوتنە ژێر ئینتداب و قایل بوون بەوەی بریتانیاو فرنسا مامۆستاو ئەوانیش قوتابی بوونە دەولەت و ئیستا لەو ڕووەوە بەختەوەرن،(عیراق وسوریاو ئوردەن ولبنان و وولاتانی تری ئەفریقی )سوریا لە 1934 بوو بەدەولەت ،هەرچی عیراق بوو لەژێر ئینتدابی بریتانی باش تر بوو لە فرنساو لە3/تشرینیٚیەکەم/ 1932 رۆژی دوشەمە سەعات 11و پینج دەقیقە بوە ئەندامی (57)مینی عوسبە ویەکەمی عربی .

سەرەڕای ئەوەش هیشتا وەلامی ئەو پرسیارە ستراتیژیەی (ئینتداب سزایە یان پاداشە) نادرێتەوە ، بوون بەدەولەت ،بەڵام دەولەتی پڕ کیشە ،چونکە بە سروشتی دروست نەبووینە کیشەی یەکجار زۆریان هەیە ...بوە هۆی دابەشی ودواکەوتوویی و یەکتر قەبوول نەکردن وزۆری شەڕوکیشەکان لەو ناوچەیە بێت،دەسەلات لەگەل میلەت ،حکومەتەکان لەگەل یەکتر،هەروەها لەگەل کەمایەتیەکان:

[813] بڕوانە (دەقەکانی سیڤەرو خویندنەوەیەکی تر سلام ناوخۆش- مسعودعبدالخالق) ل108

(کورد، فارس، تورك، ترکمان، بەربەر، قیپتی، شیعە...) ، زۆربەی ئەو وولاتانەی ئینتدابی مقەوەماتی سەربە خۆیان لاوازە،تا ئیستا پیویستیان بە ئینتداب ماوە ،نمونەی عیراق دوای 58 سال لە دەرچوونی عیراق لە سیستەمی ئینتدابی (مادەی 22ی بەشی یەکەمی – عهد العصبە) جارێکی تر بە پێی بڕیاڕی 661ی نەتەوە یەکگرتوەکان چۆوە بەندی 7 و وسایەکەی*،پۆل بریمەر دەڵێ سەرۆك عەشیرەتێکی عەرەب پێی ووتم عیراق چاك نابێ واچاکە ئێوە بیکەنە ویلایەتی ژمارە (53)ی ئەمریکا[814]، وولاتانی ئینتداب گەشە ناکا ،لەوە مەترسیدار تر لە نێو خودی عەرەب ئەو وولاتانە بە خراتر لە (دولە الفاشلە) هاتوون وەك ناعوم چۆمسکی لەتویژینەوەیەکی(الدول الفاشلە)وایان وەسف دەکا ، هەروەك چۆن لەکاتی دروست بوونی وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست (لورانس) لەگفتۆگۆیەك لەگەل (تایمس) لە 1920/7/23 ووتی: من دلنیام دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانە بۆ عەرەب دلسۆزی و ئەمەکمان بۆ مسۆگەر دەبێ و نرخی سەنتیکیشی لامان نیە)[815].. ئەگەر سەرنج بدەین سەرەنجامەکەی ڕاست دەرچوو، ئێستاش بەشی هەرە زۆری وڵاتانی عەرەبی بە ئەمەکن بۆ ڕۆژ ئاواو لای ئەوانیش نرخیکی وایان نیە، زیاتر لەوەش سنوری ئەو وڵاتانە بووینە پەرژینیك بۆ پاڕاستنی سنوری ئیسرائیل[816]، هەرلەسەر وەسفی سعد زەغلول کەجامیعەی عربی دروست بوو ووتیان جامیعە مانای کۆی (22سفر)[817]، لەوەش خراتر (م قەزافی) لەکۆنگرەی بەغدا وتی بڕیاڕەکانی لەنێوان (0، ـ 1 سفرو ناقس یەکە) ،هەمو ئەوانە هۆیەکەی ئەوەیە دەولەتی سروشتی نین لەسەر سێکوچکەی یاسایی (هەرێم-گەل-دەسەلاتی سیاسی)[818] ڕاستەقینە دروست نەبوە .

**** **** ****

---

* میثاق امم المتحدة مکونة من 19 فصل و111مادة، تبدا فصل السابع من مادة 39 وتنتهی فی مادة 51.

[814] بول بریمر- عام قضیة فی العراق ص71

[815]ـ کوتلوف- ثورة العشرین ص211

[816]ـ الموسوعة السیاسیة عبدالوهاب کیالی - طبعة الثانیة بیروت 1993، ج 3 ص453

[817] د.الیاس فرح- من قضایا الثورة والانسان العربي ص29.

[818] بڕوانە دەقی مادەی (1)ی ڕێکەوتنامەی مونتیڤیدیۆی 1933.

لە دوای هەلوەشانەوەی عوسبەو دروست بوونی نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو سیستەمە سپاردەی ئەو کرا بە ناوی (سیستەمی وسایا) کە لەمادەی (77)ی **میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان جێی ئینتدابی گرتەوە ،لە بڕگەی یەکی دیاری کردوە چ دەگریتەوە ،ئەوە دەقەکەیەتی:**

**( يطبق نظام الوصاية على الأقاليم الداخلة في الفئات الآتية مما قد يوضع تحت حكمها بمقتضى اتفاقات وصاية: (أ) الأقاليم المشمولة الآن بالانتداب. (ب) الأقاليم التي قد تقتطع من دول الأعداء نتيجة للحرب العالمية الثانية. (ج) الأقاليم التي تضعها في الوصاية بمحض اختيارها دول مسؤولة عن إدارتها).**

(27)

## جیهانی سێیەم العالم الثالث Third world

زاراوەیەکی سیاسی وفەرهەنگی وئابووریە مەبەستیان وولاتانی دواکەوتوە، پاش جەنگی جیهانی دوەم سەری هەلدا لە سەرهەلدانیکی تری دابەشی جهانی یەکەم(رۆژئاوا) جیهانی دوەم ( ورۆژهەلات) و باقیەکەی تر ئۆتۆماتیکی بە جیهانی سێیەم ناونران ، ئەو وولاتانەن ڕاستەوخۆ سەر بە جیهانی یەکەم(سەرمایەداری) وجیهانی دوەم(سۆشیالیستەکان) نەبوون ، لە بنەچەدا ئەو زاراوەیە دەگێڕنەوە بۆ (ئەلڤەرد سۆڤی ) یەکەم جار لە سالّی 1952 بەکاری هێنا ئەویش لە بارودۆخی چینایەتی فرنسای دوای شۆرشی 1789ی وەرگرتبوو ،کەچینی سێیەمی کۆمەلگەیان بریتی بوون لە: نە چینی برجوازی(ئاینی و مەدەنی) نە چینی هەژار ، پیش ئەو (جۆزیف سیاس) کتیبیکی نوسی بەناوی (چینی سێیەم)، لە کتیبەکەی ترۆتسکی هەمان زاراوە بەدی دەکرێت (1- چینی کنیسە Leclerge 2-چینی ڕەسەنەکان La Noblesse 3- چینی سێیەم Le Tiers-Eatئەوانەن کە سەربەودوو چینە نین ، عەوامی خەلك)[819] ،هەندی سەرچاوەی تر ئاماژە بە فرانزفانون خاوەنی کتیبی (**معذبوا الارض** ) دەکەن وەك یەکەم جار زاراوەی جیهانی سێیەمی بەکارهێنابیت، بەشیکی تر بۆ جەنرال دیگۆل و جاروایە بۆ (پۆل سارتەر) و (هربرت مارکۆز) هی تریش، **دوای** (ئەرمنج هۆریفیوتز) لە کتیبیك بەناوی (**عوالم ثلاثة للتنمیة**) لێکی جیا کردنەوەلەسەر بنچینەی ئاستی ئابووری ، جان لاکوتیر بەو وولاتانەی ووت جیهانی سێیەم کە نەسودیان لەئەزمونی رۆژئاوا (شۆرشەکانی 18 و19ی سەرمایەداری )وەرگرتوە نە لەرۆژهەلات(ئەزمونی بیستی سۆشیالیستی)وەرنەگرتوە ،لەلای خۆشی پاپا پیۆسی دوازدەم لە کۆتایی سەدەی 19 بانگیشەی (ڕێگەی سێیەم)ی کردبوو نەسۆشیالیستی ونە سەرمایەداری..[820]، لەوانەوە ڕێخۆش بوو بۆ ناوی جیهانی سێیەم ، ئەوە کەمێك جیایە لە بۆچونەکەی ماوتسی تۆنگ بەناوی تیۆری(سێجهان) کە تیایدا جیهانی یەکەمی بۆ

---

[819] لیون تروتسکی –تاریخ ثورة الروسیة ج1ص44

[820] بۆزیاتر لەبارەی سەربردەی (الطریق الثالث)لەلایەن پاپا بڕوانە: قاموس المصطلحات المدنیة والسیاسیة –د صقر الحیالی واخرین ص101

ڕۆژئاواوهێزەگەورەکان گێڕاوەیە ،جیهانی دوەمیش ئەوانەی هاوپەیمانی جیهانی یەکەمن ،هەرچی جیهانی سێیەمە وولاتانی رزگاری خواز[821] ، تارادەیەکیش جیایە لەگەل تیۆری شۆڕشی ئێرانی 1979(لاشرقیه ولاغربیه جمهوریه اسلامیه) ، بەگشتی ئەوانە باوەڕیان بەدوو جیهان هەیە لە ئایندا هەق وناهەق ،لەمارکسیشدا دوو جیهان کەلەسەر دوو چینەکە(برجوازی وپرۆلیتاری)بنیات نراوە .

لە سەرچاوەی قاموسە دەولیەکان دەلێن لەدوای 1973 سەربەخۆ بوونی موستەعمەرەکان زاراوەی جیهانی سێەم خێراتر سەری هەلدا ، زیاتر وولاتانی خواروو دەگریتەوە یان ئەوانەی پێیان دەووتری وولاتانی حەفتاەحەفت[822].وولاتانی خوارووش لەبەرامبەر وولاتانی سەرووی دەولەمەند دێت کە(ئەمریکا و ئەوروپای سەروو ویابان)دەگریتەوە ، لەنێو ئەودابەشیەی ئەوانەش دواکەوتوو تر هەیەلەلایەن (un)ەوە پۆلین کراون پێیان دەووترێ جیهانی چوارەم.

جیهانی سێیەم ئەو وولاتانەی زۆر هەژارو دواکەوتون، ئەوانەی ناتوانن گەشەی ئابووری و گەشەی دانیشتوان پێکەوە گرێبدەن ، مەگەر لێرە تیۆرەکەی مالتۆس تارادەیەك نزیك بیت لە راستی لەبارەی گەشەی دانیشتوان بە پێی زنجیرەی ئەندازەیی(توالی الهندسی) وگەشەی ئابووریش بەپێی زنجیرەی (توالی الحسابی)، ئەو جۆرە وولاتانە کاتی خۆی سیستەمی ئینتدابی سەردەمی عوسبەت ئومەم بۆ دیاری کرا لەپۆلی ( A,B)، پۆلی ( c) یش بۆ جیهانی چوارەم ، دوای باوی وەرگرتو بووە زاراوەیەکی نەرم وبەرێزەوە بۆ ئەو ولاّتانەی کە دوا کەوتوون لە ئابووری و تەکنۆلۆجی و باری سیاسی،زۆربەی چڕ بووینەوە لە ئاسیاو ئەفریقیا، بەشیکی زۆری ولاّتانی موسولمان نشین دەگرێتەوە...، پرسیارێکی گرنگە بۆچی ئیسرائیل هەر لەگەل دروست بوونی نەبوە دەولەتێکی جیهانی سییەم کەچی لەناوجەرگەی وولاتانی جیهانی سێیەم دروست بووینە ،لەوەوە جاریکی تر سەرنجەکان گەڕانەوە بۆپێکوە بەستنی جهانی سێیەم بە ئاین وشارستانی وکیشوەر، ،سەرەڕای ئەوەش سنوری جوگرافیەکی دیاری کراویان نیە ،ئەوانە بەتەنها لە کیشوەرێك کۆبووبنەوە یان لە

---

[821] ئەو تیۆرە لەلای سۆڤیەت وشیوعیەکانی جیهانی سەربە (جیهانی دوەم) بە توندی رەخنەیان لیگرت چونکە جیهانی یەکەم ودوەمی تیکەل کردبوو .

[822] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة –د احمد سعیفان ص234

ئاینێك یان له شارستانی ومەدرەسەیەك ،له هەمو لایەك هەن ، تەواو جوگرافی نیه لەوەی( یابان وئیسرائیل وخوارووی ئەفریقیا وچین ) نمونەی جیاجیان له کیشوەری جیا جیا و له ئاین ومەدرەسەو شارستانی جیا لەو گرۆپە نین ، جیان له دەوروبەری خۆیان ، تەواو سیاسیش نیه وولاتی مارکسی (یۆگوسلاڤیا- کۆبا –کۆریای سەروو-کەمبۆدیا-یەمەنی خواروو ) ، کەچی سۆڤیەت وباقیەکەی تر له جیهانی دوەمن ،بەلام زیاتر بەلای جیهانی دوەمی شیوعیەت بوو ، ناویان نا بیلایەنی ئیجابی . یەکەم جار نهرۆ دەستەواژەی (حیاد الایجاب) ی بەکارهینا له قەیرانی کۆریای 1950 بەکاری هینا[823] .

زۆر جار (دول النامیة) شیان پیّ دەوتریّ، زۆر جاری تر به پەیوەندی نێوان وولاتانی زلهیزو سەرمایەدارو وولاتانی جیهانی سێیەمیش دەووتریّ پاشکۆیی یان (ئیستعماری نویّ)، له (الموسوعه المیسره) دەلیّ ئەو زاراوانەشی پیّ دەووترێت (دول النامیه-دول غیر نامیه- دول الجنوب- دول المتخلفه- مجموعه 77 –دول اقل نموا- )[824] ،ئەگەر وولاتانی 77 گوزارش بیت له تەوەری ئابووریەکەی ئەوا به ڕای زۆربەی ئەنسیکلۆبیدیەکان وولاتانی بیلایەن(عدم الانحیاز) گوزارش لەتەوەری سیاسی نیودەولەتی جیهانی سێیەم دەکا، تەنانەت( **قاموس حزب البعث**) و(الموسوعه العالمیه)وولاتانی جیهانی سێیەم ووولاتانی بیلایەن به یەك چەمك دەزانن ،لەبەر ئەوەی زۆربەیان موستەعمەره بووینه دژ به ئیستعمار، هەندیکیش پێیان وایه ئەو زاراوه تایبەته به ئیستعمارو نیازەکانی ،ئەو ناوه هەر له فەرهەنگی (دونیه - inferiority )ەی ئیستعماره دەیدا بۆ موستەعمەره تا وای تیبگەیەنی ئەو لاوازەو ناتوانی گەشه بەخۆی بداو دەولەتی پی دروست نابیت ،مقەوەماتی گەشەی نیه پیویستی بەوان هەیه.

زاراوەی (عدم انحیاز) یان بیلایەنی ئیجابی کۆنه لەسالی 1961 بیلایەنی (عدم انحیاز) له کۆبونەوەی بلگراد جیی گرتەوه ،یەکەم جار نهرۆ دەستەواژەی (حیاد الایجاب) ی بەکارهینا له

[823] الموسوعه العربیه ج13ص29

[824] الموسوعة المیسرة للمصطلحات السیاسیة ص284.

قەیرانی کۆریای1950 بەکاری هینا[825] ،بەلام وەك (عدم انحیاز) دەگەریتەوە بۆ کۆنگرەی باندونگ
.

لەدوای رووخانی سۆڤیەت و جەنگی سارد وهەلوەشانەوەی جیهانی دوەم وهاتنی عەولەمە ئەو زاراوەیە بە خێرایی کالْ بوویەوەو **دوای پاساوی ناوی (عدم انحیاز) نەما جاریکی تر زاراوەی (جیهانی سییەم )زەق بۆوە** ،یان زاراوەی تری هاوتا جێی گرتیتەوە بۆیەش وا بەزۆر جۆرە زاراوە گوزارش دەکریت وەك لەسەروو تۆمارکرا.

**<u>هەندێ پێناس</u>**

بابەتێك نیە کیشەی پیناسی هەبێت وزۆر بێت ،بۆیە کەمیکی لێهەلدەبژێین :

+زۆربەی بە وولاتانی دواکەوتووی وەسف کردوە ،بە گوزارشی جیاجیا.

+هەندیکی تر پیناسەکەیان سادە کردۆتەوەو دەلێن ئەو وولاتە دواکەوتوانەن کە سودیان لە شۆرشی پیشەسازی وەرنەگرتوە .

+الموسوعە السیاسیە: ئەو وولاتانەن کە ئاستی ئابووری وتەکنۆلۆجیان لاوازە [826].

+الموسوعە العربیە العالمیە: العالم الثالث اسم يطلق أحيانًا على الأقطار النامية اقتصاديًا، وخصوصًا في آسيا وإفريقيا وأمريكا اللاتينية. كذلك فقد استخدم مصطلح العالم الثالث للأقطار غير المنحازة سياسيًا.

+ موسوعة السياسية للمصطلحات السياسية: هو مصطلح سياسي واقتصادي واجتماعي وثقافي، يقصد به الدلالة على الدول التي لا تنتمي إلى العالمين الأول والثاني.

---

[825] الموسوعە العربیە ج13ص29 .

[826] کیالی– الموسوعة السياسيةج3 ص801

+الموسوعة المصطلحات السياسية: ظاهرة اقتصادية حضارية تشمل انخفاض مستوى المعيشة النسبي وما ينتج عن ذلك عادة ، من ضعف في المستويات الثقافية و البنى الفوقية في المجتمع ومن عدم دراية بالمفاهيم العلمية والمنتجات والاختراعات العلمية الحديثة .

+(المعجم الحديث للتحليل السياسي) : (هو مصطلح سياسي واقتصادي واجتماعي وثقافي، يقصد به الدلالة على الدول التي لا تنتمي إلى العالمين الأول(معسكر الاشتراكى) والثاني(معسكر الرأسمالى)[827].

<u>**به سياسى بوونى جيهانى سێيەم (وولاتانى بێلايەن)**</u> : ڕیشەیەکی دوو جیهانی ( جیهانی یەکەم ودوەم) لە مێژوو هەبوە ،کاتی خۆی لە فارس ورۆم بەرجەستە بوو ،دوای لە سێیانیان (عوسمانی سەفەوی رۆم )،لە سەدەکانی نوێ لە پینج خەملی(عوسمانی وروسیاو پروسیاو فرنساو بریتانیا )،دوای دەولەتی عوسمانی وکەوت چوار مانەوە ،دوای ئەلمانیاش شکا 3 دەولەت مانەوە (روسیا-بریتانیا-فرنسا) ،لەدوای جەنگی جیهانی دوەم ئەمریکا سەری هەلدا لە رۆژئاواو لە رۆژهەلاتیش سۆڤیەت ، کەوتنە ململانیی وجەنگی ساردو جیهان دابەش بوو ، ئەو کاتەی بووە دووجەمسەری بوە دابەشی جیهان، زاراوەی جەنگی سارد یەکەم جاربۆ (خوان مانۆئیل)ی سەدەی 14دەگەڕێتەوە ، برنشتاین جارێکی تر لە کانگەی ململانێیەکانی ئەوروپا بەکاری هێناوە ،جاریکی تر ئابووری ناسی ئەمریکی (برناردپارش)لە سالی 1947 بەکاری هیناوە ، لای سۆڤیەت بەراشکاوانە لە بنەمای شیوعیەت ودوایش لە کۆنگرەی بۆتسدام هەلبژاردن ودیموکراسی رەتکرایەوە بەلکو رژیمی لایەنگری سۆڤیەتی لە 1945 لیدروست بوو لە (رومانیا وبلغاریا ویوغسلافیاوالبانیا)دوای لە1947(مەجەروپولندا)دوای1948( تشیکوسلوفاکیا) ..دوای ستالین لە 1947هەمو حزبە شیوعیەکانی جیهانی لە دژی پرۆژەی مارشال کۆکردەوە مەلبەندیشی لە بەلگراد بووتا لە 1955 هەلوەشایەوە .

---

[827] المعجم الحديث للتحليل السياسي ص455 .

له لای ئەمریکاش پرۆژەکانی بۆ هاوپەیمانی نیودەولەتی دژی رابوونی شیوعی پەرپەوە بۆ ئۆروپای رۆژهەلات ،ناتۆ له 1949 راگەیەنرا پیکهاتبوو له 12 وولات (ئەمریکا ، بریتانیا ، فرنسا ، هولندا ، لوکسمبورك ، کندا ، نەرویج ، ئیسلندا ، دانمارك ، ئیتالیا ، بلجیکا ، برتغال)دوای هەریەکەلە(تورکیاو یۆنان وئەلمانیای یەکگرتوو )له1952و1956 هاتنه ناوی بوه 15 وولات به هاتنی ئیسپانیا له 1982 بوه 16 وولات ،هەر له زیاد بوونه تائیستاش 28 وولاتی تیدایه ، رۆژئاوا(جیهانی یەکەم) هەر بەناتۆ نەوەستا زۆر جۆره هاوپەیمانی تری دژی شیوعیەت(جیهانی دوەم) دروست کرد لەوانه :حلفی سەنتۆ ،حلفی بەغداد،پەیماننامەی خواروئاسیا..، بەو شێوەیه له تەقەلای دروست کردنی بەرەو بەرەی بەرامبەر جەنگی سارد سەرهەلدەدا له نێوان دوو جیهان ،جەنگی سارد یەك مەیدانی نەگرتەوه بەلکو پەرپەوە بۆ ململانێی سیاسیو دیپلۆماسی وئایدیۆلۆجی و تەنانەت زانستیش ، کەوتنه کیبرکێی پیشکەوتنی تکنۆلۆجیش له جیهانی تر پیشتر کەوتن، لەو نێوانه ئەو دووجیهانه کۆمەلیك وولات له هیچ لایەك لەو هاوپەیمانیه نەبوون ئیتر ئۆتۆماتیکی جیهانی سێیەم ووولاتانی بیلایەنیان لیدروست بوو .

جیهانی سێیەم لەگەرمەی ململانێی نێوان هەردوو هیزی گەورەو لایەنگرەکانیان بوون ، بریتی بوون له ناوچەیەکی جوگرافی ئاسیاو ئەفریقا وئەمریکای لاتین وزۆربەیان وولاتانی کۆلۆنیال بووینه ، ئەزمونی سیاسیو دەسەلاتی تازەبوو ئابووریەکی دواکەوتوو کۆمەلگەیەکی سادە..کاریگەری دەولیان لاواز بوو ، بۆ ئەوەی گوزارش له بوونی خۆیان لەسەر ئاستی نێودەولەتی بکەن ،هەولی دارشتنی قاوغێکی سیاسی دەولیان دا،ئەویش له هەناوی وولاتانی جیهانی سێیەم وبەهەمان فلسفه بەرەهەندی سیاسی (بزوتنەوەی وولاتانی بیلایەن- Non-Aligned Movement )هاته کایەوه ، جاریش وایه بەهەندێکیاندەووترێ (دوله الرخوه - the soft state) ئەو وولاتانەی جیهانی سێیەمن که گەندەلی زۆر بلاوەویاسا سەروەرنیه وبەرژەوەندی کەسی زاله ودامەزراوەیی نیه[828]،یەکەم جار لەسەر پیشنیاری سەرۆکانی یۆگوسلاڤیاو هندو میسر(تیتۆ-نهرۆ-ناسر) وولاتانی بیلایەن له ململانیی رۆژهەلات ورۆژئاوا دروست بوو ، بریاری دروست بوونی له سالی 1955ی کۆنگرەی باندۆنگی

---

[828] معجم مصطلحات عصر العولمة ص239 .

(ئەفرۆ ئاسیەوی) درا 29 دەولەت بوون ،دوایی زیاتر لە 104 دەولەت بوونە ئەندام[829] ، یەکەم کۆنگرەیان لە سالی 1961لە بەلگراد بەست 25 وولات بوون ،ئەگەر لەسەرەتا کەمێك ڕاست بیت دوایی بیلایەنی ئیجابی هاتە نێوئەو ڕێکخراوە وولاتانی جیهانی یەکەم ودوەمیشی کەوتە ڕێز و بەتەواوی لە مانای جهانی سێیەم جودا بوویەوە ،هەروەك خمینی بە راشکاوانە ووتی وولاتی بیلایەن نیە جگە لە شۆرشی ئیران بەدروشمی(لاشرقی ولاغربی)ئەگینا باقیەکەی تر لایەنێکن، سەرەڕای ئەوەش بە خیرایی زیادیان کرد لە کۆنگرەی دوەمیان لە قاهیرە 1964 گەیشتە 47 وولات،لە کۆنگرەی سێیەمی لۆزاکا 1970گەیشتە54 وولات، لە کۆنگرەی چوارەمی جزائیری 1973 گەیشتە 75 وولات، لە پینجەمی کۆلۆمبۆی سالی 1976گەیشتە 87وولات، لە شەشەمای هاڤانای سالی 1979 سالی گەیشتە 92وولات ، لە حەفتەم لە نیودەلهی گەیشتە 102 وولات ،هەشتەم لە1986 هەراری و نۆیەم لە بلگراد 1989، دەیەم جاکارتا 1992،یازدەم لەکارتاجینا لە 1995،دوازدەم لەدیریان 1998،دوازدەم 2003 و کۆتایی لە کوالالامپور 116 وولات بەشدار بوون ، لە پیگەی (تۆڕی هەوالی وولاتانی بیلایەن –NNN) 120وولات تۆمارکراوە ، سکرتیرەکانی لە خواروو دیاری کراوە .

| سةرؤك | اوولات | لة | تا |
|---|---|---|---|
| جوزيف بروز تيتو | يوغسلفيا | 19 1 | 1964 |
| جمال عبد الناصر | مصر | 1964 | 97 |
| كنيث كاوندا | زامبيا | 9 0 | 1973 |
| هواري بومدين | الجزائر | 197 | 6 9 |
| | | 76 | 8 19 |
| جونيوس ريتشارد جاياوردنه | | 1978 | 9 1 |

[829] لەو مەوسوعەیە( تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص43 )كۆمەلیك هەلەی كردوە لە بارەی سەرەتاو یەكەم كۆنگرە ،هەر لەسەروو ڕاست كراوەتەوە .

| | | | |
|---|---|---|---|
| فيدل كاسترو | كوبا | 197 | 3 19 |
| سانجيفاردي | | 83 1 | |
| زايل سنج | | 1983 | 1986 |
| رۆبيرت مۆگابی | زيمبابوي | 19 | 89 |
| | | 89 | 19 |
| | | 1991 | |
| برانكو كوستچ | | 1991 | 199 |
| | | 92 1 | |
| سوهارتو | إندونسيا | 1992 | 19 |
| إرنستو سامپر پيزانو | | 995 | 19 |
| | | 98 1 | |
| نلسون مانديلا | | 1998 | 99 |
| ثابو مبيكي | | 9 19 | 2003 |
| مهاتير بن محمد | | 200 | |
| عبد الله أحمد بدوي | | 2003 | 00 |
| فيدل كاسترو[] | كۆبا | 200 | 2008 |

**ليستى وولاتانى بيلايەن :**

( أفغانستان - الجزائر - أنگولا- أنتيگا وبربودا- البهاما- البحرين- بنگلادش- بربادوس- بلاروس- بليز- بنين- بوتان - بوليڤيا - بتسوانا - بروناي - بوركينا فاسو - بوروندي - كمبوديا - الكاميرون - الرأس الأخضر - جمهورية أفريقيا الوسطى - تشاد - تشيلي - كولومبيا - جزر القمر - الكونغو - ساحل العاج- كۆبا- الكونغو الديمقراطية- جيبوتي-

دومنيكا- جمهورية الدومنيكان - الإكوادور- مصر - غينيا الإستوائية- إرتريا- إثيوپيا- فيجي- الگابون- گامبيا- غانا- گرينادا- گواتيمالا- غينيا - غينيا-بيساو- گويانا- هايتي- هندوراس- الهند- إندونسيا - إيران- العراق- جامايكا- الأردن- كنيا- الكويت- لاوس- لبنان- لسوتو- ليبريا- ليبيا- مدغشقر- ملاوي- ماليزيا- الملديڤ- مالي- موريتانيا- موريشيوس- منغوليا- المغرب- موزمبيق- بورما- ناميبيا- نيپال- نيكاراگوا- النيجر- نيجريا- كوريا الشمالية- عُمان- پاكستان-فلستين- پنما- پاپوا غينيا الجديدة - پيرو- الفلپين- قطر- رواندا- سانت لوشيا- سانت كيتس ونڤيس- سانت ڤنسنت والگرنادينز- ساو تومه وپرنسيپه- السعودية- السنغال- سيشل- سيراليون- سنغافورة- الصومال- جنوب أفريقيا-سري لانكا السودان- سورينام - سوازيلاند- سوريا- تنزانيا- تايلند- تيمور الشرقية- توگو- ترنيداد وتوباگو- تونس- تركمنستان- أوغندا- الإماراتالعربية- اوزبكستان- ڤانواتو- ڤنزويلا- ڤيتنام- اليمن- زامبيا- زيمبابوي)[830].

## بارودۆخی جیهانی سێیەم :

لەسەردەمی نوێ لەنیو جۆرە پۆلینە جوگرافی نەژادی و جەستەیی ورەگەزی وئاینی و... چالاك ترینیان پۆلینی ئابووریە, بۆیە ئەو دابەشیەی جهان لەسەر بنچینەی ئابووریە, واتە کە دەڵێن ئەو وولاٌتە پێش کەوتووە یان پاش کەوتووە مەبەستیان لەڕووی ئابووریە، جیهانی سێیەم بەو تەرازوە پۆلین کراوە ئەگینا مەرج نیە لەهەمو ڕووەکان بەو پلەیە لەدواوە بێت، ئەوەی ئەو پۆلینەی بەهێزکردوەلەسەر جیهانی سێەم و (وولاتانی بیلایەن) نەبوونیانە لە پۆلیك بە پەتیانەیە ،یەك ئاین ویەك کیشوەرو یەك نەژاد نین ،هەرچەندە لە پیناسا جۆریك لە ناسنامەی جوگرافی وشارستانی وسیاسیان پێدەرێ بەلام تەواودروست نیە ، بوونی هەریەکە لە(یۆگۆسلافیالە ئەوروپا، یابان لە ئاسیا، میسر لە ئەفریقا..)لەو ڕیکخراوە ئەوە دەسەلمینیت، تەواو سیاسیش نیە وولاتی مارکسی وەك: (یۆگوسلاڤیا- کۆبا –کۆریای سەروو-کەمبۆدیا-یەمەنی خواروو ) ،وولاتانی سەرمایەداریشی تیدا بوو وەك(یابان ،کۆریای خواروو ..)، لەڕاستیشدا لەهەلویستیشا تەواو بێلایەن نەبوون، زیاتر بەلای جیهانی دوەمی شیوعیەت بوو ،لە بیلایەنیەوە پەڕینەوە بۆ( بیلایەنی ئیجابی ) ئەو ناوەش یەکەم جار (نهرۆ)بەکاری هێنا لە کیشەی کۆریا ، زیاتر رۆژئاواو ئەمریکا بە ئیستعمار وەسف دەکرا کەمتر ئەو جم وجۆلەی داگیرکاری سۆڤیەت ولایەنگرانی بە ئیستعماری وداگیرکاری وەسف کرابوو ، تەنانەت

---

[830] سودلە((تۆڕی هەوالی وولاتانی بیلایەن –NNN) و( موسوعەی معرفە) وەرگیراوە .

له بنەماكانی مافی چارەنوس و مافی مرۆڤ بۆ جاریكیش ناوی كوردی تیا نەهاتبوو ، له بڕیارەكانیدا گوایه لایەنگری میلەتانی ژێر دەستەی گرتوە .

هەرچەندە عەولەمە كۆمەلیك پۆلین وچەمكی گۆڕی بەلام نەیتوانی هەندێ نیشانەكانی جیهانی سێیەم بگۆڕی بەتایبەتی رەهەندی جوگرافیەكەی ،ناسنامەی كیشوەری و وولاتانی خوارووی پێوە لكاوە ،بەلام دوای ئەوەی (تا ڕادەیەكی زۆر) له (دول عدم الانحیاز)كۆبوونەوە ئەو لێلیەی نەماوزیاتر سروشتی سیاسیەكەی دەركەت، دەركەوت ئەو سێ فاكتەرە تایبەت نیە بە جیهانی سێیەم ،مەرج نیە هەمو( هەژاربن ، هەمو موستەعمەرە بن ،هەمو لە یەك كیشوەر بن،..) بەلكو وولاتی وەك یابان وكۆباویۆگوسلاڤیا سعودیەو .. تیابوە كە سەربە جیهانی یەكەم ودوەمی تیدا بوە ، كەواتە وەسفیكی گشتیمان دەست دەكەویت نەك بەڕەهایی.

دواكەوتن پیناسی بنچینەی ئەو جیهانەیە، هەمو لایەنەكان دەگریتەوە له بوارەكانی تكنۆلۆجی وتەعلیمی وتەندروستی و سیستەمی سیاسی و ...،تەنهاله زیادبوونی دانیشتوان وزاوزێ لەپیشەوەن، ئەوەش سەلبیە ، زۆر هەیە پیناسەكەی لێرە گیر دەكا ودەلێ هاوسەنگی لەنێوان زیادی زاوزێ وكەمی بەرهەم وولاتیكی دواكەوتووت بۆ بەرهەم دەهینی ، وە ك لەسەروو باسی تیۆرەكەی مالتۆس كرا ، ئەو تیۆرەی لە كتیبی ( مقال عن مبادئ السكان وتأثیرها في مستقبل المجتمع An Essay on the principle of population as it affects the future improvement of Society ) كۆكرایتەوە .

له كۆتاییدائەو جیاوازیانە لە نێوان ئەو سێ جیهانە تایبەتمەندی دروست دەكا ، ئەوەش رەنگدانەوەی سیاسی دەبیت ودەبنە ولاتی پاشكۆ،لەسەر ئاستی نیو دەولەتیش كاریگەریەكی وایان نابیت ،وەك سەرەنجامێكی لۆجیكی ئەندامیكی هەمیشەشیان نیە لە نەتەوە یەككگرتوەكان .

**نیشانەكانی :**

لەسەر ئاستی ناوەوە: له هەندێ مەوسوعە بە وەسفیكی وەك (دیكتاتۆری) كۆتایی بە ناسنامەی جیهانی سێیەم هێناوە، بەلام قاموسی(Amodern Dictionary )دەلێ ڕاستە زۆربەی جار ئەوانەن كە

دیکتاتۆرو دواکەوتەن .بەلام ئیستا ئەو زاراوەیە ئاوا نەماوە[831] ، کەواتە لە دۆخیکی وەرچەرخاندان بەو شێوەیەی خوارەوە :

- لەرووی کۆمەلایەتیەوە: ئاستی خویندەواری وتەندروستی رۆلی ئافرەت لاوازە، وزاوزێی زۆرو مردنی زۆر ولەکاتی گەشەشا لە وەرچەرخانی کۆمەڵگە ستونیەکان بەرەو مەدەنیەتە، وەرچەرخانی ئینتمای خێڵەکی بەرەو نەتەوەیی .
- لەرووی سیاسیەوە: دەولەتی تازەن لەئەنجامی_گۆرانی ئیمپراتۆریەکان بۆ وولاتـانی هاوچـەرخ (مەلەکی وکۆماری) ویان بە شۆرش دروست بووینە ، لەقۆناغی دیکتاتۆری تاك رەوی بۆ دیکتاتۆری دەزگایی وحزبی وپاساوی شۆرشگێری وپینەگەیشتن بـاوە ،لـە پەیوەندیەکانیـدا زیـاد لـە پیویسـت وابەستەیە بە دەرەوە ،کەمتر وولاتەکەی ئارامە ، سیستەمیکی ئابووری روونی نیە ، لە گەشەشدا لە قۆناغی گۆرانی ئینتیمای کۆمەلایەتی ستونی بۆ ئینتمای سیاسی ئاسۆیی ، لە پەیوەندی خێلەکی بۆ پەیوەندی فکری و حزبیشەوە یە .
- لە رووی ئیداریشەوە عادەتەن گەندەلی و رۆتینـی وبـەرتیل بلاوە،پسـپۆری و دابەشـی کـارو هەماهەنگی لاوازە ،کات بە فیرۆدان و کەمی نەخشەو پلان و
- لە رووی زانستیەوە پیشکەوتو نین ،وولاتی پیشەسازی وداهێنەر نین .
- لە رووی فەرهەنگی ومەدەنیەتەوە لە قۆناغی وەرچـەرخانن لـە پاشـکۆیەتیەوە بـۆ نیمچـە سەربەخۆ . مەبەست لە(پاشکۆیی)ئەگەر چی ماناکەی فراوان ترە بەلام کە وەردەچەرخێتە زاراوەیەکی نیودەولەتی ئەو کـات مەبەسـتی وولاتـانی دواکـەوتوو و جیهـانی سـێیەمە لەبەرامبـەر وولاتـانی پیشکەوتو وجیهانی یەکەم ، یان بە وولاتانی دەوروبەر لەبەرامبەر ناوەند وەك لە ئـەمریکای لاتینـی وا بەکاردێت.
- لەرووی ئابووریەوە : عادەتەن ئەو وولاتانە لە قۆناغی کشت وکالین ، سەرەرای ئەوەش کەمی بەرهەمبەتایبەتی بەهەمی تەکنۆلۆجی ،بلاوبوونەوەی بیکاری و، دابەشیەکی چینایەتی لەسەر بنچینەی سیاسی وفیودالی پیکەوە ، لاوازی داهاتی تاك ..وولاتیش لە ژیر قەرزە ..بۆگەشەش لە

[831] - Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts p455

قۆناغی وەرچەرخانی ی کشتو کاڵ بەرەوپیشەسازی ، لە بازاری ناوەکی بەرەو بازاری جیهانی ، لە بەخێو کردن بۆ جیّ نشینەوە ، لەقورسایی لادیّ بۆ قورسایی شار ، لەوەرچەرخانی چینی دەرەبەگ بۆ چینی بورجوازی ، وەرچەرخانی کرێکاری کشتوکاڵ بۆپرۆلیتاریا..
بە تێکڕایی هۆکاری ئەو دیاردانە پیچەوانەی ڕای باوە کە گوایە میلەتانی ڕەسەن لە پیشەوەن ومیلەتانی کۆچ وجێگۆڕ دەبنە جیهانێکی دواکەوتوو سێیەم ،ئاوانیە ، ئەو میلەتانەی زیاتر کەمایەتی وموهاجر هەولیداوە کاری عەقلی بکا بۆ پڕکردنەوەی ئەو نەقسەی کە ناتوانی بە هیز وپانتایی فراوان بیکا (بەتایبەتی ئەوانەی فکریشیان هەیە)..بۆیە شارستانی وپیشڕەوایەتی وداهینان لەسەردەستی ئەوانەبوە ..لەو بارەیەوە یەهودیەکان خاوەنی پەیامیکی تایبەتین کەچی کەمدەستیش بووینە بۆیە زیاتر پیشاوەرێك بووینە ئیستا بوونە میلەتیك و ولاتێك سەر بەجیهانی یەکەم —ئەوە وەلامی پرسیارەکەی سەرووشە لەبارەی ئیسرائیل ، ئەوانەکاری عەقلیان کردوە زیاتر لە کاری بازوویی،کاری شاریان کردوە زیاتر لە گوندی،کاری پیشەسازیان زیاتر کردوە لە کشت وکالی ،پیچەوانەشی کاری میلەتانی جیهانی سێیەمە کە گەلیّ جار دەسەلاتدارەکانیشی بەشێك بووینە لە وەستاندنی گەشەیان بۆ مانەوەیان لە دەسەلات .
<u>لەسەر ئاستی دەرەوە</u> : وولاتانی جیهانی سێیەم لە شیوەی پەیوەندی هەژارانە بەیەکتر کەمتر هەماهەنگی و پتەوی لە ریزەکانی دەبینریّ ، چەندین جهان وپارچەی تری تیدایەجهانی عربی وجیهانی ئیسلامی وئەفریقی ولاتینی وئاسیاوی و گرنگ ترین قەوارەی سیاسی بریتیە لە (کۆمکاری عربی وکۆنگرەی ئیسلامی وریکخراوی یەکیتی ئەفریقی ...)لە هەموان گرنگ تر بۆ جیهانی سێیەم وولاتانی بیلایەنە کە بالی سیاسی هەژمار دەکریت ە لەسەروو زیاتر باسکرا.

ئەوەی گرنگە لەو مادەیە مەرج نیە جیهانی سێیەم هەر بەودۆخە بمێننەوە ،مەرجیش نیە لە مێژوودا بۆیان مابێتەوە ، لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەوروپا تووشی ئەو دەردە ببوو کە لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو فەرهەنگی ئیسلامی وئۆروپی ئەوان تووشی تەقەزوم دەبوون ،ناچار خۆپاریزیان دەکرد لە ئەدەبیات وفەرهەنگی ئیسلامی، تا ئەو ڕادەیە کتیبەکانی ئیبن روشد وئەوانی تریان دەسوتاند ،لەو بارەیەوە (ئالان دولیبرا) لەکتیبەکی(کیفیە التفکیر فی القرون الوسگی)بە ووردی لەسەر ئەو بابەتەو

تەقەزومی ئۆروپی وەستاوە ،دەلی هەتا شارەزای کتیبەکانی ئەرستۆو ئەفلاتونیش نەبوون لەرێی جیهانی ئیسلامی بۆیان هاتەوە ، دوای تەکانیان بەخۆداو رێزی پیشەوان بۆخۆیان هەلبژارد لەهەردوو جیهانی یەکەم ودوەم ، بەکورتی بوار هەیە جهانی سێیەم بپەڕنەوە بۆ جیهانی دوەم وهەتا یەکەمیش ، چونکە بۆچوونێك هەیە دەلێت لەبەرژەوەندی جیهانی یەکەم ودوەمە کە جیهانی سێیەم وچوارەم بەو دۆخە بمێننەوە ، لیوهامن-لەکتیبەکەی **(الدور الخارج عن عسکرة للجیش فی العالم الثالث)** دەلێ جیهانی یەکەم ودوەم چەندە رۆلیان هەبوە لە بەرپا کردنی جەنگ ونائارامی لە وولاتانی جیهانی سییەم ،نمونە گەلێ زۆرە ،نا ئارامی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەوەتەی سایکس پیکۆ 1916 ەوە بێئەوەی چارەیەکی ڕیشەیی بدرێت ،لە کتیبی **(تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب )** ریزی کردوە لە ناکۆکی وشەڕو نائارامی بێوێنە لە جیهان هەر لەشەری عرب وئیسرائیل وعرب خۆبەخۆو جەنگی عیراق ئیران 3 جەنگی تری کەنداو تا ئیستاش لە هەمو رۆژهەلاتی ناوەراست بەردەوامە ، ئەودۆخەی جیهانی سێیەم لەشەڕوشۆڕونائارامی بازاڕێکی ئامادە بۆجیهانەکانی تر دەرەخسێنێ، بۆیەش دەبینین زۆربەی وولاتانی جیهانی سێیەم میلەتەکانیان لەنگەی(جل وبەرگی کۆنە)میلەتانی جیهانی یەکەم دەکڕنەوە ،لەسەر ئاستی دەولیش وایە،کاتی خۆی کە یسنگافورە لە ڕێزی جیهانی سێیەم بوو کۆنە چەکی ئیسرائیلی کڕیوە لەسالی1968 دەبابەکانی ئیسرائیلی (AMX-13)کڕیوەتەوە[832] ، ئەوە دۆخی سەنگافوورا بوو بەلام دوای تەقەلایان سەلماندیان بەماوەیەکی کەم هاتنە ڕێزی جهانی یەکەم ، لی کوان کتیبیکی هەیە بەناوی **(من العالم الثالث الی الاول–قصة سنغافورة 1965–2000)** باس لە یەکێ لەو ولاتانە دەکا کە لە جیهانی سێیەمەوە پەڕیەوە بۆ یەکەم ،ئەویش ولاتی سەنگافوورایە کە خۆی سەرۆك وەزیرانی بوە ،هۆکارەکانیشی دیاری کردوە،لەهەموی گرنگتر دوورکەوتنەوە لە( کۆمەلگەی چینایەتی -گەندەلی –دیکتاتۆری-تقزم سەقافی ) پشت بەستن بە (دادگەری –میانڕەوی –پاکی –دیموکراسیوئازادی –خۆبەخیوکردن) ،دەشلێت بۆ ئەوەی کۆمەلگایەك دروست بکات پیویستی بە (رعایە الاجتماعیە )نەبێت ،خۆمان لە بازاڕی ئازاد دوور خستەوە کە ببتە هۆی دروست بوونی چینایەتیەك کەمایەتیەك زۆری بەرکەوێ

---

[832] لی کوان– (من العالم الثالث الی الاول –قصة سنغافورة 1965–2000)ص40 .

وزۆرایەتیەکیش کەم،لە لەدوایدا لە 90٪ ی کریکارانیشیان پشکی لە کۆمپانیای (سەنگافورا کۆریسپۆندانس-واتە پەیوەندی) هەبوە ،

بۆدادگەریەکە جۆریك لە سۆشیالیستی دیموکراسی هەلبژاردوە کە تایبەتمەندی خۆی هەیە ،ڕەچاوی تاك وکۆ کراوە ،ئەزمونی هەبوە نەوەك سەرمایەداری مافی گشتی خواردوە نەەك سۆشیالیستیش مافی تاك بخوا ، بەو هۆیەوە لە سالی 1959 کە لی کوان بوە سەرۆك وەزیران داهاتی تاك بریتی بوو لە 400$ لە سالی 1990 گەیشتە 12200$کە دەسەلاتی بەجێهێشت سەنگافورا تیکرای داهاتی تاك لە 1000$ بازیداوە ئیستا بۆ 300000$ هەروا گەشە بەردەوامە ولە زۆربەی پێوانەکان لەپیش جیهانە[833] .

## پۆلینیکی نویێ:

چەند گۆڕانکاری گەورە ڕوویدا لەکۆتایی سەدەی بیستەم و سەدەی نویێ وا دەکا پیداچوونەوە بۆ ئەو زاراوەیە بکەین، یەکەم زەق بوونەوەی عەولەمە ،دوەم پیشکەوتنی هەندێ وولاتی جیهانی سێیەم بەرەو یەکەم وەك (چین وکۆریای خواروو وسەنگافورەو ئیران و..کە بە وولاتانی پیشەسازی نویێ وەسف دەکرێن ) ئەوانە لە جیهانی سێیەم هاتوونەدەر، وەك (لی کوا )کتابێکی هەیەبەناوی(لە جیهانی سێیەمەوە بۆ یەکەم) لەسەروو باس کرا، هەندیکی جیهانی دوەمیش بەرەو سێیەم ،هەلگرتنی دروشمی (نە رۆژهەلاتی ونەرۆژئاوایی)لەلایەن شۆرشی ئیرانیەوە وای کرد ئەو ئاڕستەیەی نیو جیهانی سێیەم بەناوی (بیلایەنی ئیجابی- کەبەرەو جیهانی دوەم بوو) بوەستێ ،ئەوانەو هەلوەشانەوەی جیهانی دوەم ، وای کرد ئەو پۆلینە بە ووردی نەمێنێتەوە ، فۆرمێکی تری دابەشی جێی بگریتەوە ، بۆیە ئەو زاراوەیە لەگەلٚ تێك ڕووخانی سەربازگەی سوشیالیست جارێکی تر کەوتەوە ژێر پێداچونەوە،بەتایبەتی لایەنە سیاسیەکەی کە بریتی بوو لە وولاتانی بیلایەن، کۆنگرەی حەوتەمیان لە نیودەلهی بوە دوا کۆنگرەو بە بڕیاڕ کۆتایی بە(وولاتانی بیلایەن)هینرا،جاریکی تر گەرانەوە سەر زاراوەی جیهانی سێیەم،ئەویش وەك خۆی نەمابوو، چونکە وولاتانی کۆنە

[833] لي كوان – من العالم الثالث الى الاول– ص21 ص25ص136 ص147 .

سۆشیالیستیش بوونه دووبەش، بەشێکیان کەژێرخانی ئابووری و تەکنیکیان باش بوو بەرەو سەرمایە داری و بازاری ئازاد و یەکێتی ئەوروپا ڕۆیشتن ،باقیەکەی تریش بەرەو لای جهانی سێیەم, کەواتە ئێستا سێ جهان نیە, دوو جهانەوەك تیۆرەکەی مارکس لەبارەی(بۆس المتزاید)کە پیشبینی کردبوو چینەکانی ناوەڕاستی نێوان(دەولەمەندو هەژار-برجوازی وپرۆلیتاری)لە ژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداری ساغ دەبێتەوە بۆ چینی هەژار ،ماو تسی تۆنگ بناغەیەکی تری بۆ سێ جیهانی داناو پێیوابوو دابەشیەکەی جیهان بەو شێوەیە: جهانی یەکەم هەردوو هێزی گەورەی جیهانی (ئەمریکاو سۆڤیەت) ،جیهانی دوەم هاوپەیمانانی ئەمریکاو سۆڤیەت ،جیهانی سێیەم بریتین لە بزوتنەوەی ولاتانی بێلایەن ، بەلام بە خێرایی لەلایەن مارکسیەکانی جیهانەوە ئەو تیۆرە ڕەتکرایەوە هەتا لەهاوپەیمانیکی وەك (ئەنوەرخۆجەی —سکرتێری حزبی شیوعی ئەلبانیا) ، هاتنەوە سەر دووجیهانیەکەی هەژارو دەولەمەند(پرۆلیتاریاو برجوازی) ،لەگەل شکستی تەواوی شیوعیەت ئەو تیۆرانەش ڕووخان ،بەلام ڕاستیەك هەر مایەوە کە هیشتا لە پۆلینی نوێ ودیزاینی ئابووری جیهانی دوو لایەنە ، جهانێك زۆر پێشکەوتوو ئەوەی تریش پاش کەوتوو جهانی یەکەم کە جاران (سەرمایەداری)یێ دەووترا ئێستا زیاتر ناوی وولاتانی سەروویان پێ دەوترێ کە بریتیین لە ئەمریکای سەروو و بریتانیاو فرنساو وولاتانی ئەسکندینافی و ئیتالیاو ڕوسیا و کۆریاو یابان.... باقیەکەی تر وولاتانی خوارووی پێ دەوترێ, لەنێو وولاتانی خواروو هەندێ وولات لەگەشەن و بەرەو جهانی یەکەمن لەوانە: سەنگافورە, مالیزیا, ئێران, خوارووی ئەفریقا...,جاریش وایە هەندی زاناو فەیلەسوف هۆکاری بوونی ئەو جیاوازیەو بوونی جیهانی سییەم دەدەنە پال جوگرافیاو ئاین ونەژاد وئەو ئال وگۆڕەیان قەبوول نیە ،خەریکە بلێین بەجۆریکی تر دەگەڕێنەوە سەر تیۆرەکانی کۆنی یۆنانی و نوێی (گۆپینۆ شامپیرلن ونیتچەو ...) زۆربەی زانایانی ڕۆژئاوا پێیان وایە ڕەگەزی ئاری ئەو ڕەگەزەن کە داهێنانی هەیەو سامی نیەتی لە ئێستاو لە مێژوو وابووە, ئیبن خەلدون بە جۆرێکی تر دەلێ(کە ئاریین) بینا دەکا و عەرەب (کەسامین) تەخریب دەکا, لەگەلٚ زۆر جۆرە ڕای تر.وای کردوە لەو سەردەمە بە فۆرمیکی تر بەرجەستەی پیشڕەوایەتی( ئاری وئەوروپا )بکەن و خەلکی تریش بۆپاشکۆیی، بۆیە هەندێ زانا نەیان شاردۆتەوە و دەلێن دیموکراسی ومەدەنیەت و بۆ وولاتانی جیهانی سێیەم نەگونجاوە بەتایبەتی وولاتانی عربی ، ئەوەی ئەو تیۆرە بە هێز دەکا ئەوەیە ، هەندێ

وولآتانی عەرەبی لە ئابووریش باشە (بەهۆی سامانی ژێر زەوی نەك بەهۆی ئیعمار) هەر دواکەوتوە لەو بوارانەی سەروو باس کرا، لەوەوە (قاموس حزب البعپ) دان بەوە دەهێنی و دەلی وولاتانی عربی (دەخلی قەومی)بەرزە بە هۆی نەوت کەچی هەر بە جیهانی سییەم هەژمار دەکریت مادام مەرجەکانی پیش کەوتووی لینایەتەدی[834] . کەچی لە پەیامی ئایین هاتووەو وەك ئەرك خستوویەتە سەر شانی مرۆڤ کە شارستانی بەرپا بکات، لەو بارەیەوە لەو سەردەمە دەبینیت کەمتەرخەم ترین میللەت میللەتانی موسوڵمانە لە بارەی (ئیعمار) و بەرپاکردنی شارستانی، کە خۆیان لەپۆلینەکان خستۆتە هەرە دوای.

بەکورتی ئیستا ئەو دابەشیەی جیهانی یەکەم ودوەم وسێیەم نەماوە ،بەلکو دابەشیەکی تر جێی گرتۆتەوە پێیان دەلێن جیهانی سەروو وجیهانی خوارو ،ئەوانە وولاتانی خوارووشیان پێدەووتریت ونزیکەی 80٪ی جیهان پیك دەهینن ،کەچی 20٪ی داهاتیانە، لە ئاماری 1998ی نێونەتەوەیی دەرکەوت دوای لە (کۆنگرەی زەمین)یش لە جوهانسبرك دووپات کرایەوە، (خەڵکی سەروو) لە 20٪ی دانیشتوانی جیهان پێك دێنن کەچی لە 86٪ی داهاتەکان دەخۆن، (خەڵکی خوارووش) لە80٪ دانیشتوانن کەچی لە 14٪ دەخۆن، پەیوەندی جیهانی سییەم بەیەکەم بریتیە لە هەڵلووشینی لەلایەن سەرمایەداری وەك(ڕۆجیە گارۆدی) گۆتەنی[835]،بەپێی( Swiss Observatoire de la Finance) سویسری بۆ دارایی ئەوا800 دەزگا دەستی بەسەر نیوەی داهاتی جیهان داگرتوە، دەبێ ئاگاداربین بۆ کردنەوەی بازاڕی ئازاد دوو جەنگی جیهانی کراوە لە نێوان جهانەکانی یەکەم بۆدابەشی جیهانی سێیەم ،ئیستاش زۆربەی ئەو جەنگانە لەپێناو کردنەوەی بازاڕی ئازادە ،لە دوای یەك سال داگیر کردنی عیراق قازانجی کۆمپانیای (هالیپرتۆن)و (پاکتل) و(شیڤرۆن) زیاتر لە 80٪ی زیادکرد[836] .

ماوە ئەوە بلێین چارەی دۆخی جیهانی سێیەم بە پێی مارکسی شۆرش دژی ئیستعمارو

[834] تعریفات ببعض المصطلحات –مکتب الثقافة والاعلام ص346.

[835] روجیە گارودی- امریکا طلیعة الأنهیار ص184 .

[836] عبد الحی زلوم – أزمة نظام الرأسمالیة والعولمة فی مأزق (بیروت : المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، 2009 ) ، ص44.

سەرمایەداری و ڕووکردنە سۆشیالیستی ،لەو ڕوەوە فرانك کتیبیکی هەیە بەناوی (الرأسمالیە والتخلف فی امریکا اللاتینیە ) ئەویش دەلێت جیهانی سێیەم بەوە رزگاردەبێ خۆی لەژێر پاشکۆیی ولاتانی جیهانی یەکەم دەربهێنێ[837] ، کەچی ئەوەش ڕوویدا بەدەگمەن نەبێت ئەو چارەیەی نەبوە .

[837] جۆردن مرشل- موسوعة علم الاجتماع ج1 المادة:نظرية التبعية .

(28)

| Insurrection | الانتفاضة | **ڕاپەڕین** 1991 |
|---|---|---|

**ئەوانەش دەگریتەوە** (صفحه الغدر والخيانه، 15ی شعبان، ثورة الحجارة، ئەخلاقی کوردەواری،شەڕی کۆڕێ، ستراتیژی سیاسی...)

بەو جمو جۆڵ و هەڵچوونە جەماوەریە دەوترێ کە بەهۆیەکی سەرەکی هەستیار ڕادەپەڕێ، لە دژی دەسەڵاتدارێکی زۆردار بەرپادەکرێت بۆ هێنانەدی ئامانجێك کە ڕای گشتی لەسەر دروست بووە، عادەتەن ئەو ڕاپەرینانە زۆر بەنەخشە و پلان و ڕێکخستن نیە، بەڵکو ڕەمەکی و بێ سەروبەرییش لێ بەدی دەکرێت، جیاوازە لەگەڵ شۆڕش کە خاوەن بەرنامەو ڕێکخستن و ئامانجیکی روونی عەقلانی ونەخشەو پلانە، بەشداربوانی ڕاپەرین زۆرتر ن و نارێکترن لەشۆڕش ،ماوەی ڕاپەڕین وەك شۆڕش درێژ نیە ،خاوەنی سەرکردەو ئامانجی ڕوون وداڕژراو نیە، بە نەخشەو پلان وستراتیژی نیە، ڕاپەرینی جەماوەی پێویستی بە بارودۆخی زۆر تایبەتترە لەوەی شۆڕش لێ ی سەرهەڵدەدات.

ڕاپەڕینەکانی گەلی فلستسنسش دژی داگیرکەری ئیسرائیل لە 1987 بەدواوە چەند جاریك دووبارە بوویەوە جاروابوو بە شۆڕشی بەردەقانی یان(ثورة الحجارة)ناوزەد دەکرا ،بەلام عبدالوهاب المسيري بەتوندی بە گژئەوەداچوویەوە ڕاپەڕین وشۆڕش تێکەل بکرێ ودەلێ ئەوە ڕاپەڕینە نەك شۆڕش[838]، جیاوازیشە لەگەل ڕاپەڕین ورێنیسانسی ئەوروپی سەدەکانی16 و17، لەناو کورددا زیاتر بە ڕووداوەکانی1991دەووترێ ڕاپەڕین لەدژی دام ودەزگای حکومەتی بەعس،تیایدا تەواوی کوردستانی باشور لەحکومەتی بەغدا پاك کرایەوە لەلایەن میلەتەوە، ئەو زاراوەیە دووبارە دەکرێتەوە ویادێکی فەرمیشە، مەبەستیان هەڵسانی جەماوەری خەڵکی کوردستانی باشوورە لە دژی دام ودەزگای سەرکوتکاری بەعس لە5-3-1991وەك یەکەم گلپەی لە شاری ڕانیە ، بەسەرکەوتوویی کۆتایی هات و واقیعێکی سیاسی نوێ دروست بوو ، تا ئیستاش بەرهەمەکانی بەردەوامە ،سالانە

---

[838] د عبدالوهاب المسيري –فی الخطاب والمصطلح الصهيونی ص226 .

لەهەمو کوردستان لە رۆژی 5ی مانگی ئادار ئەو یادە دەکریتەوە، بەناوی ڕاپەڕین ،لە قاموسی حکومەتی بەعسی ناوی (صفحه الغدر والخیانه) بوو .

بیرۆکەی ڕاپەڕین گرنگی خۆی هەیە کە لە قۆناغی نوێی کوردایەتی بۆیەکەم جار بوو لە باشوری کوردستان ئەوە ڕوودات ،زیاتر ئەو بیرۆکەیە بۆ جیگری سکرتیری (ی ن ك)دەگەڕێتەوە کە گەلێ جار بەئەندازیاری ڕاپەڕینیش وەسف دەکرێت ،گرنگی لەوەیە کە پیشوو تر شۆڕش و هیرشی سەر سەنگەر هەبوە ، گرتنی شارۆچکەو بەردانی هەبوە ،خۆپیشاندانیش هەبوە ،بەلام بیرۆکەیەك لەگەل ئەو قۆناغەی دۆخی داگیرکەر جەماوەر ڕاپەڕینی لەناو شارو دام ودەزگای حکومەت ڕامالن نوێ بوو .

**جیاوازی لەگەل شۆڕش و(ستراتیژی سیاسی):** بەگشتی ڕاپەرین بەو هەڵچونە جەماوەریە دەوترێت کە لە دژی دەسەلاتدارێکی زۆردار بەرپادەکرێت بۆ هێنانەدی ئامانجێك کە ڕای گشتی لەسەر دروست بووە، عادەتەن ئەو ڕاپەرینانە زۆر بەنەخشە و پلان و رێکخستن نیە، بەڵکو ڕەمەکی و بێ سەروبەرییش لێ بەدی دەکرێت،جاروایە کاری عەبەسیشی لەگەل دەکرێ، لەوەوە لەگەل شۆڕش لە چەند خالێك لێك جیا دەکرێنەوە :

1-بەشداربوانی شۆڕش کەمترو ڕێکترن.

2- ماوەی شۆڕش درێژ ترەو سەرکردەو ئامانجیان ڕوون ترە .

3- ڕاپەرینی جەماوەی پێویستی بە بارودۆخی زۆر تایبەتترە لەوەی شۆڕش لێ ی سەرهەڵدەدات.

4- وەك شۆڕش بە نەخشەو پلان وستراتیژی نیە ،گەلێ جار ڕەهەندی عەبەسیشی تێدایە .

5- سەرکردەو بڕیارو ئامانجی وەك پێویست ڕوون نیە .

6- زۆر جار عەقلی دەستەجەمعی بەسەریدا زال دەبێ وکاری زۆر نالۆجیکی دەکرێت .

ئەوە جیاوازیە گشتیەکانە هەلبەتە هەندێ جیاوازی تایبەتیشی هەیە لەگەل شۆڕشەکانی کورد لەڕەوتی توێژینەوەکە باسی دەکەین .

بەگشتی کاری ڕەمەکی و عەبەسی وکاری بەنەخشە زۆر لیکجیان ، ئەگەر بەلای کەم بەوە قایل نەبین کە شۆڕش جم وجۆلی ناعقلانیە (وەك هەندێ لەزانایان پێیان وایە)ئەوا تاڕادەیەکی زۆر ڕاپەڕینی جەماوەری ئەو وەسفە هەلدەگرێ ،گەلێ جاریش ئامانجی چاکی هێناوەتە دی لەوانە ڕاپەڕینی ئیسلامی ئیرانی 1979 کەبەو هۆیەوە ناوی گۆڕا بۆ شۆڕشی ئیسلامی ئیرانی ، کاری جەماوەری بەزۆری توخمی عەبەسی تێدایە ،پیچەوانەی نەخشەو پلان وستراتیژیەت ،بەزۆری هەنگاوەکانیان بریتیە لە ڕووکەشی نەك قوول بوونەوە ، دیتنی یەکلایەنی نەك هەمە لایەنی ،یەك ئەنجامی لیکدرایتەوە نەك هەمو ئەگەرەکانی ،..بۆیە کەمتر پابەندە بەمەولەت و زەمان وزەمین، بەرنامەی سیاسی و فکری سیاسی تێکەل دەکرێ ،ئەوەلیات وسانەویاتی تیکەل دەکرێ ...دەست کورتە لە دیدی ستراتیژی (ستراتیژی سیاسی)کە وەسفەکەی بەو شێوەیە : بۆدیاری کردنی ستراتیژی سیاسی هەرکۆمەلەیەکی سیاسی (باکۆمەلیکی سیاسی لەکوردستان وەك نمونە)وەرگرین، یەکەم هەنگاو پێویستی بە دیاری کردنی هەمو ئەوهێزو فاکتەرانە هەیە کە کاریگەرن لەسەر ئەو ژینگە سیاسیەی ئەو کۆمەلەیەی تێدایە ،دوەم هەنگاو پۆلین کردنی ئەو هیزە کاریگەریانە بەسێ ئاست (دوورونزیکیان- ئاستی کاریگەریان –قۆناغەکانی گۆڕانی ئەو کاریگەریانە) ، سێیەم هەنگاودیاری کردنی تەوەرەکانی کاریگەریەکەیە کە بۆ ئەو نمونە وەرگیراوە بریتیە لە (کوردستانی –عیراقی – ئیقلیمی –جیهانی ) یەکەکە توخمەکانی پیکهێنەری سیاسی بۆ دەکەی ،دوای شێکردنەوەی سیاسی بۆ دەکەی لەسەر بنچینەی زانیاری وورد،هەرلەنمونەکە (کە بریتیە لە دیراسەی ستراتیژی سیاسی کۆمەلەیەکی سیاسی کوردستان) ئەوا شیکردنەوەی سیاسی بۆ بارودۆخی عیراق لەو دەمە بریتی دەبێت لەشیکردنەوەی (پیکهاتەکان – حزبەکان –دەسەلات –معارەزە- هاوپەیمانە ناوەکی و دەرە کیەکانی – هیزی سەربازی وئابووری – تەماسوکی کۆمەلایەتی-...) ،هەرچی ئیقلیمیەکەیەتی بریتیە لە کیشەکانی ناوچەکە و هاوپەیمانەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ،حەفت پرۆژەکەی چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ،سیاسەتی ئەمریکاو رۆژئاوا لەناوچەکە ،ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل ،کاریگەری ئاڕستەی سیاسی نوێی روسیا، ئەنجامەکانی بوهاری عەرەبی و دیزاینی سایکس پیکۆ ...، بەو شێوەیەش شێکردنەوەیەکی سیاسی بۆ بارودۆخی جیهان بەو ئەندازە سیاسیەی کاریگەری بەسەر ناوچەکە هەیە ... چوارەم هەنگاوی بریتیە لە دیراسەکردنی ئەگەرەکانی ڕووداوەکان لە

ناوچەکەو عیراق وکوردستان بەهۆی ئەو کاریگەریانە ، خالی هەرە قورس لە ستراتیژی سیاسی ئەو تویژینەوەیە،چونکە دیراسە کردنی ئەگەرەکانی ڕووداوەکانی سروشتی ساناترە ،مادام بە پێی یاساکانی سروشتیە ،مسەیەرە، کەچی دۆزینەوەی ئەگەرەکانی ڕووداو لە ناو کۆمەلگە زۆر زەحمەتە چونکە مسەیەر نیە هەزاران ئەگەری ووردو درشت لەپیش هەر واقعێکی سیاسی هەیە،ژمارەی ئەگەرەکان دەکەوێتە سەر ژمارەی کاریگەریەکانی (دەرەکی وناوەکی) ، لە ڕاستیشدا بۆ هەمو ئەو ئەگەرانە لەکۆتاییدا یەك ئەگەر دێتەدی وڕوودەدا ،ئەویش بە پێی یاسایە نەك عەبەسیانە ،ئەو یاسایانە پێیان دەووترێ یاسای کۆمەلایەتی ،ووردتر لەوەش پێی دەووترێ (یاسای گەشەی سیاسی) ،کە دۆزینەوەی ئەو یاسایە مانای دۆزینەوەی ستراتیژی سیاسیە ڕێك،ئەوەش زۆر زەحمەتە مەگەر زانیاریەکی هەوالگری سەد دەر سەدت لە نهینیە سیاسیەکان و فلسفەی سیاسی کۆمەلگەش هەبێت ،بۆیە بەگشتی کۆمەلیك ئەگەر دیراسە دەکرێت نەك یەك .

ئەوچوار هەنگاوەی سەروو تایبەت بوون بە بابەتی ودەوروبەر ،هەنگاوی پێنجەم بریتیە لە هەنگاوی ناوەکی (هەنگاوی کۆمەلە سیاسیەکەی دیاریمان کرد) ، ئەویش سێ پرۆسەیە ،یەکەمیان نزیك کردنەوەی بازنەی لیکدانەوە ستراتیژیەکان بەرەبەرە وئەلقەبەئەلقە لەجیهانیەوە بەرەو ئیقلیمی وبەرەو عیراقی وتادەگاتە دەوروبەری ئەوکۆمەلە ڕاستەوخۆ،دوەم دەست نیشان کردنی ئەگەرەکانی پەیوەندیدار بەخۆی (یان ئەو ئەگەرانە هەلدەبژێری کە لەو ئامانجانەی نزیکە) ،پرۆسەی سێیەم کە کرۆکی ستراتیژیەکەی بریتیە لەوەی بەپێی (لائیحەی ئامانجەکانی ) کار لەسەر ئەوە دەکا ئەو ئەگەرانە تەواو لە ئامانجەکانی نزیك بکاتەوە ،بە هۆی ئامرازەکانی بەردەستی ...جا ئەو ئامرازانە خەباتی مەدەنیە ،تویژینەوەیە ،خەباتی یاساییە ،خەباتی شۆڕشگێڕیە ،خۆپیشاندانە، شۆڕشە، ڕاپەڕینە ،... ڕوون دیارە هەرە چاکەکەی یەکەمیانە بەرەبەرە نەرێنی دەبێت تادەگاتە ڕاپەڕین ...ئیتر لەو پرۆسانە پرسی ئەوەلی وسانەوی (ترتیب الاولویات)دیاری دەکرێت ،پرسی قۆناغبەندی ،پرسی دۆست وناحەزو دوژمن ...لەگەل زۆر پرسی تر کە لەو چوارچێوەیە بە ووردی دیاری دەکرێت لە چوارچێوەی هەلچوون وڕاپەڕین کەمتر ئەو پرسانە لێکدەکرێتەوە .

## سەربردەی ڕاپەڕین

لەلای کورد شۆرش وشاخ ببوە جمکی خەباتی بەدیهینانی مافەکانی یان پاریزگاری لێکردنی ، کەمتر بوار بەخەباتی مەدەنی دراوە ، خەباتی شاخیش لەدوای ئەنفال وکیمیاوی و وێران گەیشتبوە کۆلە ڕێ ، بەگشتی هێزی دەولەتان زۆر گەشەی کردبوو لە بەرامبەردا هیزی بزوتنەوەی رزگاریخوازان (بە کوردیشەوە ) شتێکی وا گەشەی نەکردوە ،بۆیە خەباتی گەلان بە ناچاری دەگۆڕێ ،چەمکی شاخ و خەباتی دریژخایەن و ...کال بوویەوە ، ئەگەر تێ بینی بکرێت بەرگری نیشتمانی بەرەبەرە لەگەڵ گەشەی تەکنەلۆجیای داگیرکەر گۆڕا بەسێ قۆناغ، یەکەم لەسەرەتای ڕابوونی نەتەوایەتی ولاوازی تەکنەلۆجیای سەربازی داگیرکەران ئەوا بزوتنەوەکانی بەرگری نیشتمانی زیاترلە ئاستی توانای نەتەوەگەرییەکان بوو، قۆناغی دووەم لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنەلۆجیای سەربازی چیتر لە توانای تەیاری نەتەوەیی نەما، ئەوجا نۆرەی چەپیەکان هات و پێشەنگ و سەرکردەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیان کرد تا هەشتاکانی سەدەی رابووردوو، قۆناغی سێیەم و ئێستاش لە عەولەمەدا بەرگری نیشتمانی لە توانای هەردوو تەیاری نەتەوەیی و چەپی نەماوە، زیاتر بە ئایدیۆلۆجیەکی بە هێزی وەك ئاینی دەکرێ ، ڕەنگە ئەوە دوا قۆناغی شۆرش بێت بەو فۆرمە ،ناچار دەگۆڕێت بە خەباتی مەدەنی وڕاپەڕین و شۆڕشی سپی ، کەواتە دەتوانین بڵێین ڕاپەڕینی کوردستان بریتیە لە بەیەك گەیشتنێکی مێژوویی خەباتی چەکداری شاخ وخەباتی مەدەنی شار، لە کوردستان شۆرش هەر هەبوە، بەڵام ڕاپەرین ناوە ناوە بووە، لەسەردەمی حیزبی بەعس جارێکی تر لە 1982- 1983 لەکوردستان ڕاپەڕین کرا(بە بۆنەی یادی 4/24) بەڵام نەیتوانی دام و دەزگای حکومی ڕابماڵێ، تەنها توانی تەکانێکی گەورە بەشۆرشی نوێ بدات کە تا ئەو کاتەش هەر شۆڕشەکە تەواو نەببوە میللی، لەهەردوو ڕاپەرینی 1982 و 1991 دەبینین لەو کاتەیە کە حکومەتی عێراق دووچاری شکست دەبێتەوە، لەساڵی 1982 لەئەنجامی شکستە گەورەکانی لەبەرەکانی جەنگ لەگەڵ ئێران و لەساڵی 1991یش لە شکستی سەربازی لەبەرەکانی جەنگی کوێت، شۆڕشی کوردستان لەکاتی بەهێزی داگیرکەر کراوە هەرچی ڕاپەڕینە لە کاتی لاوازی داگیرکەربوە ، ڕاپەڕینی ئەو جارە تێکەل بوونێکی مێژوویی هەردوو تەوەری شۆڕش وڕاپەڕینە ، بۆیە ئەنجامێکی گەورەی دەبێت، لەو ڕووەوە بەشداری هەردوولای پیشمەرگەو میلەتی پێویست دەبێت ،جاران ڕۆلی میلەت تەنها یارمەتیدەری خەباتی شاخ وپیشمەرگە بوە —تیۆری دەریاو ماسی،ئەو جارە ئەو ڕۆلە بەرز دەبێتەوە-دەریاش دەبێتە ماسی

،بۆیه جۆره مشت ومڕێك تا ئێستا هەیە ئاخۆ كام لا لە شاخ وشار لە پیشمەرگەو میلەت ڕۆلیان زیاتر هەبوە ؟ لە ڕاستیەكەی هەردوولا ،بەلام ئەو عەقلەی توانی خەباتی چەكداری شاخ وخەباتی مەدەنی لەو كات و ساتە ناسكە بدۆزیتەوە ئەوە سەركردایەتیەكی شارەزاو لێزان بوە ،كە لەو كاتی بەرەی نیشتمانی بوو لەناو بەرەش زیاتر عەقلی سەركردایەتی (ی ن ك)بو ،بۆیەش ئەنجام ودەسكەوتی ئەو جارە وەك چەند جارە تەنها سەركەوتنێكی سەربازی لە شاخێك وچەند سەنگەریك نەبوو بەلكو ڕامالینی داگیركەر بوو لەشاخ وشار وتەواوی كوردستان ،كۆتای بە تیۆری (هەر شاخ دۆستی كوردە)هێنا ، ئیتر نۆرەی قۆناغێكی تری گەشەسەندووی بزوتنەوەی كوردستان دێت ،نۆرەی ئیدارەی مەدەنی ،بەهۆی ئەو ڕاپەڕینە ، لەو ڕووەوە كورد پیش میلەتانی عەرەب ئەو جۆرە خەباتەی داهێنا وەك لەدوای عەرەب لە بوهاری عربی بەكاریان هێنا .

<u>بارودۆخی ڕاپەڕین</u> : لەدوای كۆتایی هاتنی جەنگی عێراق- ئێران لە 1988 بارودۆخی عێراق ناوەكی وئیقلیمی وجیهانی زۆر پتەوبوو، لایەنەكانی شۆرشی كورد ئاوارەی ئێران بوبونەوە، باری سیاسی وكۆمەلایەتی وفەرهەنگی وسایكۆلۆجی كوردستانی زۆر ناسك و بێئومیدی بوو لەناوە خۆدا ،عێراق لە جەنگیدا لەگەل ئیران بە پالپشتی رۆژهەلات ورۆژئاوا سەركەوتووبوو ،پیشوو تریش شورشی ئەیلول زۆر بەبێ ئومێدی لە 1975 شكستی هێنابوو لەسەر دەستی هەمان حكومەت وحزبەوە، دووبارە لەدوای 1988 شۆڕشی نوێ شكستی هێنا ، پیشمەرگە كەوتنەوە دیوی ئیرانەوە، تەواوی كوردستانیباشورلە90 كم$^2$ كۆكرابۆوە ،تەنها 2 سال بوو شۆڕشی نوێ بە زەبری چەكی كوشندە تیكهاڕدرابوو، هەموو دێ و شارۆچكەكانی كیمیاباران و وێران كرد بوو بی سزاو نارەزاییەكی جهانی وا، بێ ئومێدی ئەوجارە لە شكستی شۆڕشی ئەیلول خراتر بوو ، هەندێ مەفەرەزەی ( ی ن ك) جموجۆلێكیان هەبو، ئەو كاریگەریەیان نەبوو، بەلام بونیان لەناوچەكانی قاسمەڕەش و سەر سنور بەمانای چاوەڕێ كردنی دەرفەتە، مام جەلال زیاتر بەكاری دەرەوە خەریك بو، لەناوەوە زیاتر نەوشیروان مستەفا سەرپەرشتی كارەكانی دەكردن و كۆسرەت رەسولێش وەك سەركردەیەكی سەربازی سەریهەلدابوو.

له خوارووی عیراقیش هاووێنەیەکی سەروو صدام حسین زۆر زاڵ ببوو به سەر کوردستان وعیراق و حزبەکەی خۆشی ،بەو ئەندازەیەش بەسەر شیعە زال بوو ،زۆربەی سونەش لەگەلی بوو ، کوردایەتی بە ئاشکرا لە نێو شیعر و گۆرانی و شانۆگەریش نەما ، لەسەر ئاستی ئیقلیمی پیگەی عیراق بەهیز بوو ، وولاتانی عربی پالپشتی بوون (جگە لەسوریاو لیبیا) ،لەگەل ئیرانیش لە رۆژی 1988/8/8 شەڕی وەستان وناکۆکیە توندەکانیان نەما، لەسەر ئاستی جیهانیش هەردوو لای شیوعەت وسەرسەرمایەداری پالپشتیان کرد، ولآتانی جیهانی سێیەم و جامیعەی عەرەبی شۆڤێنیانە پاڵپشتی عێراق بوون .

لە ناکاو لەو بێئومێدیە دەرگای گەورە دەکریتەوە ، چەندین ڕووداو پێکەوە هاتن ، پەلاماری سەدام بۆسەر کوێت و دارِمانی یەکیتی سۆڤیەت و کۆمەلێك گۆڕانکاری تر دەرگا قوفلدراوە میژووییەکانی گۆڕانکاری کردەوە ، مەگەر بە پێی یاسای ئاینی وسەرەنجامی زولم ولە خۆبایی و بە پێی ڕێسای (هەمو تەنیك لە باریکی دەپسیٚ تەنیا مرۆڤ لە ئەستوری دەپسیٚ) سەدام بەو کارە هەلساو کویتی داگیر کردو دەرگای گۆڕانکاری گەورە کرایەوە بە ڕاپەڕینینیشەوە .

## داگیرکردنی کویت (دەروازەی ڕاپەڕین ):

شیخ عبدالحمید کشك گەورە گوتاربیژی ئاینی میسر پیشبینیەکی کرد هەرچی چاوساغی دنیا هەیە وای ڕانەدەبینی ،لە ووتاریکیدا بە بۆنەی هیرشی عیراقی لە ناکاو بۆ سەر ئیران وپشتگیری وولاتانی کەنداو بۆ ئەو هیرشە لە سالی 1980 ووتی: ئەوە زولمە ئەی عەرەب ئێوە پشتی سەدام دەگرن ،دەزانن ئەگەر سەدام لەو شەڕە سەرکەوتو بیت خۆش ترین سەندەویج لای ئەو کوێتە ، دوای 10 سال لە ووتارەکەی و دوای دووسال لە وەستانی جەنگی عیراق ئیران کیشە کەوتە نیوان عیراق وکوەیت ، تێکنەگەیشتنێکی ترسناك هەبوو لە نێوان عێراق و ولآتانی عەرەبی بەتایبەتی کەنداو، لەولایە (صدام حسین)بەڕوانگەیەك ئەو ئەنجامانەی جەنگی عێراق و ئێرانی دەخوێندەوە کە هەر ئەوە پارێزگار و پاسەوانی دەرگاو دەروازەکانی ڕۆژهەلآتی عەرەب و گوایە ئەو نەبوایە شەپۆلی (شۆرشی ئیرانی) لە ولآتانی کەنداو نەدەگەڕایەوە، لەو لایەش ولآتانی کەنداو خۆیان دەیانزانی ئەگەر ئەوان

بەهانای عێراق نەهاتبوونایە ئەو هەموو پشتیوانەی ڕۆژئاوا لەڕێی ئەوان نەبوایە عێراق لەساڵی 1982 تێك و پێك دەشكا .. ئیتر ئەو هۆكارە دەروونیەو چەندین هۆی تر جۆرێك لە ناتەبایی عێراق و بەشێك لە وڵاتانی كەنداوی گرتبۆوە، بە تایبەتی ئەو قەیرانە داراییەی ڕووی لە عیراق كردبوو ونرخی دراوی عیراق دابەزیبوو ، ببوەجێی سوكایەتی كوێتیەكان بەرامبەر 5 دیناری عیراق كە ڕووداویكی كویتی لەگەل ئافرەتیكی عیراقی ڕاستەوخۆ باری دەروونی سەرۆكی عیراقی هەلساند ، چەندین دانیشتن ونێوبژی كرا زۆر بە خێرایی گەیشتە ئاستی ئەوەی عیراق هیزەكانی لەسەر سنوری كوێت كۆكردەوە ، دەرچوونی لە شەڕەكانی ئێران وكوردستان وناوەخۆ بە سەلامەتی و شەڕانگێزی هەمیشەیی سەركردایەتی عێراق بووە هۆی خولێكی تری جەنگی لەگەڵ كوێت، ئەو كوێتەی یارمەتی دەری بوو لە دژی ئێران و كورد و .. ،لەگەڵ كوێت پێنج جۆرە ڕێكەوتنی دراوسێی و عەرەبی و جیهانیش هەبوو ،كەچی هیچی دادی نەدا ، عیراق لەگەل كویت ریكەوتنامەی 1963ی هەبوو تیایدا دانی بەو سنورەی كویت نابوو ، ویستی وەك سەندەویج بیخوا ،لە ناكاو لە بەرە بەیانی 2ی ئابی 1990 كویتی داگیركردو بەرگریەكی وای سوپای زەبەلاحی عێراقی پێنەكرا هەتا بەئەندازەی هێز و بەرگری پێشمەرگەی كوردستانیش.

هەر ئەو بەیانیە عێراق بلاوكراوەیەكی جاڕداو جیهانی سەرسام كرد، تیایدا وا هاتبوو كە گەلی كوێت ڕاپەڕیوون و تەختی بنەماڵەی ( صباح زادە)یان تێك ڕووخاندووە،هەر ئەورۆژە میلەتی كویت بڕیاڕی داوە ( علا محمد علی ) بكاتە سەرۆكی كوێت... لەلای ( كوێت ) یش هەموو دامو دەزگای ڕاگەیاندنی وەستابوو تەنها یەك ئێزگەی ڕادیۆی لەكار نەكەوتبوو، ئەویش تەنها یەك بانگەوازی بۆ جیهان دووبارە دەكردەوە و هاواری دەكرد كە جیهان بەهانایان بێت بۆ ئەومەینەتیەی خەڵكی كوێت تێیكەوتووە، لە دوای چەند ساتێك دەركەوت هێزەكانی عێراق كە ماوەیەك بوو لە سەر سنووری كوێت بەزیادەوە كۆ ببونەوە هێرشیان كردووەو كوێتیان داگیر كردووە، ڕاپەڕینی میلەتی كویت وهەلبژاردنی سەرۆك هەموی سیناریۆیە ، عیراق لەو سیناریۆیە بەردەوام بوو ، دوای ماوەیەك (سەرۆك عەلا ) خۆیو دەوڵەتی كوێتی گوایە بە یاساییانە هەڵوەشاندەوەو بووە شاری نۆزدەیەمی عێراق، ئیتر كاردانەوەی جیهانی و عەرەبی زۆر بەتووندی دەستی پیێ كرد لە هەموو لایەك، یەكسەر

خرا بەندی حەوت لە میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، خێراترین سزای ئابووریەکە بوولە 16/ 1990/8  بە پێی مادەی 39ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، بە داسەپاندنی ئابڵوقەی ئابووری کە دەماودەست کاریگەری تووندی لەسەر عێراق کرد، چەندین بڕیاری تری (ئەنجومەنی ئاسایشی )لەسەر دەرچوو تا لەکۆتایی دا مەوڵەتی یاسایی نێو دەولی درا دوا مەولەت 1991/2/15 بە ئەمەریکاو هاوپەیمانان کە بەزەبری هێز عێراق لە کوێت دەرپەڕێنن، تا لە شەوی 18/[17]/ 1991/3 هاوپەیمانان ( 31 وڵاتی جیهانی) هیرشیان دەست پێ کردو عیراق زۆر بە توندی شکستی هێنا ،هاو پەیمانان دەیان توانی شاری بەغداش بگرن بەلام جەنگیان ڕاگرت ، عیراق بە زەلیلی قایل بوو بە مەرجەکانی شەڕ وەستان ،هیزەکانی لە دوای زەرەریکی زۆر بە سەرشۆڕیوشکاوی گەڕانەوە .

کاریگەریەکانی شکستی عیراق (هانی ڕاپەڕین) :

لەپیش ئەو گۆبەندەی عیراق بەرامبەر کویت سەدام حسین زۆر زاڵ بوو بەسەر باری ناوەخۆی (کوردستان و شیعی و ناوحزبی بەعسیش)، بەلام بەزەبری هێز نەك هاریکاری،مەترسی ناوەکی نەمابوو بە ڕواڵەت،بۆیە هەمو پلانەکانی کەوتە سەر سەرکەوتن لە کویت ،کەچی لەویش زۆر خراپ شکستی هێنا و بوە شکستیکی سەرانسەری وکاریگەری گەورەی کردە سەر چارەنوسی عیراق بەو شیوەیەی خوارەوە :

بۆ یەکەم جار عیراق کەوتە بەندی (7) لە میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان کەلە13مادە پێك هاتوە ،لەمادەی 39دەست پێ دەکا تامادەی 51،  ئەو بەندە تەرخان کراوە بۆ ئەو وولاتانەی شەڕانگیزن، یەکەمین ولات لەو سەردەمە کە دوچاری سزای نێو دەولەتی بوو عێراق بوو ،کەبە بڕیاری 661ی 1990 ( ئابلوقەی ئابووریەکە) دەست پێدەکات ،پشت بەمادەی39ی بەندی حەوتەم دەبەستێت ، باقی بڕیارەکانی تریش لەسەر ئەو بڕیارە بنیات نراوە، بە پیچەوانەی بەندەکانی تر بەندی 7 توندەو دەبی جێبەجێ بکریت ، ڕاسپاردە نیە ،وەك لە عیراق بینیمان لە کۆسۆڤا پێشوتریش لەکۆریاو سیرالیۆن و کۆنگۆ و..،یەکەم جار بە سزاو تاوتوێی ئابوری دەست پێ دەکا بە پێی مادەی 39 ،ئەگەر ئەو هەنگاوە بێ سود بوو ئینجا  دەست بۆ سزای سەربازی دەبەن بەمەبەستی جێ بە جێ کردنی بڕیاڕەکان ، بەو شێوەیەی خوارەوە:

1-چونکە خۆی کۆمەڵێك ئابلۆقەی ناوەکی و ئیقلیمی خستبووە سەرەخۆ، ژێرخانی ئابووری عێراق بریتی بوو لە (3) تەوەری ئابووری سەرەکی، یەکەمیان کشتوکاڵ ئەوا بەدەستی خۆی وێرانی کردبوولە ئەنجامی ئیجرائەتی دژی کوردلەسەروو وشیعە لە خواروو، دووەم پیشەسازی لە جەنگەکانی عێراق — ئێران و عێراق — کوردستان وێران کرابوو، سێیەم بازرگانیشی لەگەڵ وڵاتە دراوسێیە سەربەخۆکان بە بازرگانی نەوتیشەوە داخرابوو، تەنها لەگەڵ وڵاتانێك کە سەر بە ڕۆژئاوا بوون، بۆیە هەر ئابلۆقەکە جاڕدرا لەلایەن (UN) یەکسەر سەرکەوت بە تۆکمەیی وعیراق کەوتە زیندانی ڕاستەقینە .

2- هاوپەیمانان پالپشت بەو بەندە هیرشی سەربازیان بۆسەر عیراق دەست پیکرد ،دوای ئەوەی عیراق شکستی هیناو بەرگری پینەکرا قایل بوو بەو بڕیاڕانە جەنگ وەستا عیراق کەوتە ژیر باری بڕیاڕی قورس تر .

3- شکستەکانی لە جەنگ بە پیچەوانەی ئەو تەکەبورەی زۆر بە ترسنۆکانە کۆتایی هات بارودۆخیکی زۆر شۆرشگێری لە ناو میلەت دروست کرد ، هەمو لایەك هەولیان لەگەل سەدام دا (سۆڤیەت ومیسر ...)لەهەموان کاریگەرتر (بریماکۆف) (لە کتیبەکەی -شرق الاوسط بین المعلوم والمجهول)بەدریژی باس لەسەردانەکەی دەکا بۆ لای سەدام وئەو تێڕوانین وبۆچوونە چەوتانەی لایان کۆببۆوە .

4-کۆمەڵێك بارودۆخی نویٚ هاتە پێش لە جیهان و ناوچەکە، سەرکردایەتی سیاسی عێراق(صدام حسين ) هەستی بە گرنگیەکەی نەکرد،حیسابێکی دژواری بۆ ئیران وڕابوونی ئاینی کرد، لەلایەن ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوەو وڵاتانی عەرەبی و کەنداو بە پشتیوانی هەواڵگیریەکانی ئەمەریکاو ئیسرائیل توانیان ئەو شەپۆڵەی بەناوی (تصدير الثورة ) ی ئێران ڕابگرن بە هۆی جەنگی عیراق لەگەل ئیران،کارتەری سەرۆکی ئەمریکا لە یاداشتەکانی باسی چۆنیەتی سەرهەلدانی جەنگەکە ناکات بەلام ئەوە ئاشکرا دەکات کەجەنگ هەلگیرسا دەلیت رینمایم بە سعودیەو عومان دا خاکەکەیان بۆ هیزەکانی عیراق ئاوەلا بکەن دژ بە ئیران ودەشلیٚ هەرلەوکات 3 فرۆکەی سیخوڕی ئۆڤاکسم بۆ سعودیە نارد،ئەگینا شۆڕشی ئیران بەرەو ئەو وولاتانەی کەنداویش دەڕۆیشت[839]، ئیتر (صدام حسين ) ئەو نازەی پێشتری

---

[839] مذكرات جيمى كارتر- ت:شبيب بيضون ص190 .

لەلای وڵاتانی عەرەب و هەموو بەرەی دژ بە ڕابوونی ئیسلامی لێ بووە لەخۆبایی لە قەبڵاندنی بارو دۆخی جیهانیو ناوچەکە، گەلێ جار یاخی دەبوو لەو بەرەیە، بەتایبەتی لە ژێر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانکاریە ترسناکەی لە هاوسەنگیەکانی جیهان ڕوویدا، جەمسەری یەکێتی سۆڤیەت بەرەو هەڵوەشانەوە بوو، ڕۆڵی تاکجەمسەری و زاڵیەتی ئەمەریکی سەری هەڵدا، تیۆری ستراتیجی سەدام کلاسیکی بوو ،بە هەمان پیوانەی دەولی دووجەمسەر کاری کرد، تووشی شکستی گەورە بوو .

نیوبژیەکی زۆر کرا بۆ کشانەوەی عیراق لە کویت ،هەمو جیهان بە دۆستەکانی عیراقیشەوە داوایان لە سەدام حسین کرد بکشیتەوە بە گوێی کەسی نەکرد ،لە هەموان ترسناك تر رینماییەکی سەرسوڕهینەری بە هیزەکانی سەربازیدا و ووتی: ئەگەر بەدەنگی منیش داوای کشانەکرا لە کویت ئیوە دلنیا بن ئەوە دەنگی من نیە بەلکو ئەمریکاو هاوپەیمانان ئەوەیان دروست کردوە ، سەرەڕای هەمو ئەوانەش سەدام نەهات داوای لیبوردن بکا یان بلی هەلەم کرد وەك شکستەکەی جەنگی حوزەیرانی 1967 نیوان عرب و ئیسرائیل وای لە جمال عبدالناصر کردو لە 9/حزیران/1967 ووتی هەموی خەتای من بوو[840] کەچی سەدام ئەوەشی نەگۆت...

لە ژێر ئەو بارو دۆخە لە خۆباییە شکست بینی و بە هەمو بڕیارەکان رازی بێت بەتایبەتی بڕیاڕی ژ: (687)ی 1991/4/3 لیژنەی پشکنین بۆ چەکە قوڕس وقەدەغەکانی عیراق .،قوڕسایی وهەیبەتی سەدام وحزبی بەعس وحکومەتی عیراق زۆر لاواز بوو ، لە بنەچەش عیراق بە هۆی ترس و سوپاو ئاسایش وەستابوو بۆیە ڕاپەڕین لە ناوچەکانی شیعەو کوردستان سەرەنجامیکی لۆژیکیە ودەبێ ببێ.

<u>ڕاپەڕین لە خواروو</u> : وەك کوردستان ڕاپەڕینی خواروو وەلامی 60 سالی دەسەلاتی توندی کەمایەتی عیراق بوە دژ بە کوردو شیعە ، ڕایەکی گشتی هەبوو وەك زەمینەی ڕاپەڕین بەلام نەخشەو پلانەکی وورد نەکرابوو زیاتر لە ڕووداوێکی ڕەمەکی و ئازایەتی سەربازیك هات ،ئەوەبوو لە کاتی گەڕانەوەی هیزەکانی عیراق بەسەر شۆڕی وگەیشتنیان بە ناو شاری بەسرە یەکیك لەشوفێرانی زریپۆشیك لە رۆژی 2ی ئاداری 1991وینەی سەدامی لەبەرچاوی خەلك وەبەر دەست ریژنی گولە دا

[840] محمدحسن الهیکل لە یادەکانی خۆی دەلیت :بە جمال عبدالناصرم ووت بلی بەشیك لەو شکستەی خەتای منە دیارە جمال عبدالناصر دەلی نەخیر هەموی لە ملە منە.

لە گۆڕەپانی سعد،ئیتر ئـەو ترسـەی شـکاندو ڕاپـەڕین تەقیـەوە ،یەکـەم شـار بەسـرەکەوتە دەسـت شۆرشگێران ،رۆژی دوەم 3ی ئادار عیمارەش کەوت،،ئەوەی زۆر یارمەتیـدەر بـوو هـەوالی ڕاکردنـی سەدام حسین بوو بۆ جزائیر، بە خێرایی بەرەو شارەکانی شیعە نشین پەڕیەوە بۆ کربلاونەجـەف وکـوت وناسریە ، ئەوەی پێی دەڵێن ڕاپەڕینی شەعبانی ،هەرچەندە لـە 11ی شـەعبان ڕاپـەڕین کـرا بـەلام لەبەر یادی ئیمام مهدی لە 15ی مانگ ناوەکەیان کردە 15ی شەعبانی .

سێ بەربەست قووت بوونەوەلە دوو هەفتەی یەکەمی ڕاپەڕین، یەکەمیان سونەکان بەشداریان نەکردو لە نزیك بەغدا ڕاپەڕین وەستا ،دوەمیشیان لەیەك کاتدا لەگەل کورد پێکەوە هەلنەستان، دوو دۆزی لێکجووداش بوو ،سێیەمیان ئەوەبوو ئەمۆیکا لە هێرشەکانی وەستاو شەڕی لەگەل عیراق ڕاگرت، لەگەل چەند هۆکاریکی تری وەك(نەبوونی سەرکردایەتیەکی مەیدانی ویەکگرتوو ، بێسەر و بەری ،دوودلی مەرجەعیەکانیا،پاگندەی زۆرو درۆ،بە هیزی گاردی کۆماری ، هەست کردن بە نەرمی رۆژئاواو کۆتایی هینان بە جەنگ ) ،مەرجەعی ئەو کاتی (ئەبوقاسم خۆئی) زۆر سست بوو ،لایەنگری (ولایە الفقیە) وڕاپەڕین نەبوو ، لەلای سەدام شۆرشگێرانی بە (غوغاو)وەسف کرد(دەشلین بە تۆبزی ولەژیر فشارا وای ووتوە) ،لە بەیانەکەشی لەکاتی ڕاپەڕین هەر داوای کۆکردنەوەی تەرم شاردنەوەی کرد، هانی نەدان بە ڕاشکاوانە ، بۆیە تەمەنی ڕاپەڕینەکە کورت بوو ، یەکەم جار بەسرە گیرایەوە لە 15ی ئادار واتە تەنها 13 رۆژ بەسرە لەژیر دەستی شۆڕشگێڕان بوو ،بەهۆی ئەوەی (علی حسن مجید) خۆی لە فیلق بوو لە بەسرە نەگیرابوو ،یەکسەر فەرمان دەرچوو بە تیرباران کردنی هەر (غەوغائیەك-شۆرشگیر) ، ئیتر شارەکانیان لەبەر دەستی شۆڕشگێران دەرهیناوە ، زۆر بەبیبەزەییانە لە ژن ومندالی شیعە درا.

بەلام کاریگەریەکی بەهێزی بەجێهێشت بۆ خێرا کردنی ڕاپەڕینی کوردستان کە باسی داهاتوومانە .

## ڕاپەڕین لەکوردستان

ڕاپەرینی ساڵی1991جیاتر لە هەرڕاپەڕین وشۆڕشەکانی تر مان ونەمانی ڕاستەقینە بوو ،لە ئەنجامی کەلەکە بوونی زوڵم و زۆریەکی یەکجار زۆر تا ئەو ڕادەیە بە کیمیایی لەو میللەتە درا و

ئەنفال کرا و ئامادەباشی بۆ ئەوە کرا بەتەواوی خەڵکی کوردستان بگوازنەوە بۆ وڵاتانی عەرەبی، ناسنامە و بوونی میللەتێك لەسەر زەوی بکوژێننەوە،لەلای سنوری خواروی 40٪ی تەعریب کرابوو، لەلای سەروو وناوەڕاستیشی تەواوی گوندو شارۆچکەکان وێران کرابوون ، هەموو خەڵکی کوردستان لە پانتایەکی دیاریکراوی کەمتر لە90 کم$^2$ کۆکرابۆوە،لەلایەکی تریش سەرۆکی عیراق (سەدام حسین) لەو ماوە کورتەی دەسەلاتی (1979-1991) سێ جەنگی کاولکاری کرد، لەهەرە دواییەکەی کوێت بوو کە زۆر بە ئابڕوچوویی شکستی هێنا و ڕاپەرینی لێ بەرپابوو. ئیترلەگەل داگیرکردنی کویت لە 2ی ئاب 1990 بووە وەرچەرخانێکی نوی لەناوچەکە، گیانی کوردایەتی وئومید کەوتەوە کوردستان ، جم وجۆلی یەکیتی بەتایبەتی رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان کەوتەوە بانگەواز کردن بۆ ڕاپەڕین،دەزگای تەشویشی دژبە ئیزگەکانی گەلی کوردستان ودەنگی کوردستان نەمابوو بە هۆی بۆردومانی هاوپەیمانان بۆ ژێرخانی سەربازی دەولەت لە هەمو عیراق بەکوردستانیشەوە ، نەخشەو پلانی تۆکمەیان دارشت ،وادیارە هەلە نەبوون کە ڕانیەو پشدەریان وەك دەستپیکی ڕاپەرین دیاری کرد،وادیارە سەرکردایەتی (ی ن ك) 7ی مانگی ئاداری 1991یان دیاری کردبوو بەلام ریکخستنەکانیان لە 5ی مانگ تەقاندیانەوە ، شاری رانیەو دوایش چوار قورنە ئازاد کرا، لەڕانیە ڕیکخستنەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیش بەشداریەکی چاکی کرد ئەگەر چیش ڕینمایی وبانگەوازی سەرکردایەتیان دیار نەبوو ،ئینجا لەدوای ئەو هەنگاوە حزبەکانی تریش بە خۆ کەوتن بە تایبەتی سەرۆکی (پ د ك)خودی خۆی شان بەشانی نەوشیرەوان مستەفا سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکانیان دەکرد.

ئیتر لەو کاتیەوە تا ئیستا لە کوردستان ئەو زاراوەیە دووبارە دەکرێتەوە ویادێکی فەرمیشە، وەك یەکەم گلپەی لە شاری ڕانیە .

<u>**ڕۆژ ژمێری ڕاپەڕینی کوردستان:**</u> لە دوای کارەسات وشکستەکانی 1988 هەندێ مەفەرەزەی ( ی ن ك) جموجۆڵێکیان هەبو لە هەندێ شاخی عاسێ، ئەو کاریگەریەیان نەبوو، بەڵام بونیان لەناوچەکانی قاسمەڕەش و سەر سنور بەمانای چاوەڕێ کردنی دەرفەتە، مام جەلال زیاتر بەکاری

دەرەوە خەریك بو، لەناوەوە زیاتر نەوشیروان مستەفا سەرپەرشتی کارەکانی دەکردن و کۆسرەت رەسولێش وەك سەرکردەیەکی  سەربازی سەریهەڵدابوو،

 بۆیە لەگەڵ داگیرکردنی کویت لەلایەن عێراق  لە 1990/8/2( ی  ن ك ) لەپێش هەموو لایەنەکانی تر لەو هەنگاوە و ڕەهەندە یاسایی و سیاسی و سەربازیەکەی گەیشتن کە گۆڕانکاری زۆر گەورە بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەوان لەو بابەتە پێشڕەوتر بوون، بۆیە نەخشەیان بۆ ڕاپەرینی جەماوەری ریکخست، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان زۆرترین رۆڵی بینی،  لەدوای شکستی گەورەی عیراق لەکویت وهەلچوونی خواروو ولاوازبوونی دام ودەزگای بەعس لە کوردستان ،جۆش وخرۆش ودۆخی شۆرشگێڕی دروست بوو ،لە1991/3/3 لە ئۆردوگای خەباتی هەولێرگرژی ونیمچە شەڕێك لە نێوان میلەت ووبنکەی پۆلیس رویدا، بنکەیان دەست بەسەر داگرت،حکومەت هیرشی کردنە سەرودوانی لێشەهید کردن دوو بریندارێش، دووکەسیش لە چەکدارانی هەرکیویەکێکیش لە رژێم کوژرا، لەناو شاری هەولێر لە شیخ الله هەندی دروشم وجم وجۆل کرا،لەرۆژی 3/4 لەشارۆچکەی حاجیاوەش هەندێ جم وجۆلی خۆپیشاندان بەرپا ببوو، بە هەمان شیوە لە شارەکانی تری کوردستان وای کرد ئەو نەخشەیەی بۆ 7ی مانگ دیاری کرابوو ڕووداوەکان بینەپیشەوە ، لە  3/5 راپەرینی بە ڕاستی خەلکی کوردستان لە شاری رانیە لە کاتژمێر 9 ی بەیانی دەستی پیێ کرد،  بۆ سەعات 3 ی ئێوارە سەرجەم رانیە لە رژێم پاککرایەوە ، هە مان رۆژ چوارقورنەوحاجیاوادەشتی بیتوێنوسەر بازگەی سەرکەپکان ئازاد کران جگە لە فرقەی(24)ی چوارقورنە ، ئەوڕۆژە لە مێژوی کورد بە یادی ڕاپەڕین هەژماردەکرێت ،رانیەش وەك دەروازەی راپەرین دادەنرێت ، رۆژی دواترڕاپەڕین لە 3/6 لەدەوروبەری ڕانیە فراوانتر بوو فرقەی 24یش گیرا،پەڕیەوەبۆ سلیمانی لە رێی  ئۆردوگای بازیان, لە کاژمێر (4)ی ئێوارە خەلکی بازیان هەڵیان کوتایە سەردامودەزگاکانی بەعسی و سەربازی وئیداری ،حکومەت وەك دوا تەقەلا  لیوایەکی لە کۆیسنجاق هێنا بەرەو ڕانیە بۆ پاڵپشتی فرقەی چوارقورنە شکستی هێناو پیگەی ڕاپەڕین توند بوو ، سەرکردە گەورەکانی شۆڕشیش گەیشتنە ناوچەکە .

لە رۆژی 3/7 بوەوەرچەرخانی گەورە لە ڕاپەڕین وجەماوەری ناو شاری سلێمانی دەستی پیکرد،بۆ ماوەی دوورۆژ تەواوی سلیمانی بەقەلای ئەمنە سورەکە و سەر بازگەی سەلام و پادگاکانی سەر چیای

ئەزمەڕیان کۆنترۆڵ کرد، به هەزاران سەرباز خۆیان دادەست ، لەهەمان رۆژ واته له 3/8 ڕاپەڕین پەڕیەوە بۆچەمچەماڵ و هەڵەبجە و عەربەت و زەڕایەن و سمود ونەسرو و باریکه و پیرەمەگرون و ئەللایی و ڕێگا سەرەکی نێوان سلێمانی و کەرکوك و باقوبە کۆنترۆڵ کران ، بە ئاڕستەی دوکانیش قەلاّی سەربازی (سوسێ)و لەلای دۆڵی خەلەکانیش جەماوەری ڕاپەڕیو بەرە و بەنداوی دۆکان دەهاتن ، بۆ ئێوارە ئەم ناوچەیەش بەتەواوی کۆنترۆڵ کرا.هەر ئەم ڕۆژەش (3/8) ئەو سەنگەرو سەربازگانەی لەپشدەر مابوونەوە له سەر مامەندە و قەلادزێ دابەزینە خوارەوە و خۆیان دابەدەست ، بەو شێوەیە ڕاپەڕین فرە ئاڕستەی وەرگرت وجەماوەر بیداربوونەوەوە حکومەتیش وورەی بەتەواوی ڕووخاو زیاتر فەوج وجاشەکان پەیوەندیان دەکرد، حکومەت دەستی کرد بە خۆکۆکردنەوەلە ناوچەپەرت و بلاوەکان ،زۆربەیان لە 3/8 چەند لیوایەکی زرێپۆشی زیادی هێنا شاخی هەیبە سولتان ، لەهەوا و لەزەمین بەرگریەکی باشییان لە خۆکرد بەلام لە3\9 خەلکی شەقلاّوە و کۆیەڕاپەڕینئەو سوپایەی چیای(هەیبە سولّتان) خۆی بەدەستەوە دا، بە ئاڕستەی شەقلاوە بۆ هەریر سەعات(4)ی ئێوارە ئۆردوگای باسرمە هەڵیان کوتایە سەر بنکەی (پۆلیس)و ئەوێش بۆ بەیانی تەواو بوو،بە ئاڕستەی گەرمیان کفری و باوەنور رزگارکران، لە 3\10 ڕاپەڕین بە هەمو ئاڕستەکان گەشەی کرد و جەماوەرەکانی مەسیف و تەقتەق و ڕەواندز و قەرەهەنجیر و ئاغجەلەر و هەریر و باتاس و خەلیفان و سپیلك و سۆران و چۆمان و حاجی ئۆمەران و مێرگەسوور.. ڕاپەڕین و هەمووی ئازاد کران.

ڕاپەڕین بەرەو لوتکە ڕۆیشت کە لە چەند لایەکەوە ڕووی لە هەولێر کرد ،سەعات یەکی دوای نیوەڕۆی کۆڕێ گیراو پاشان مەسیف ، ، هەر ئەورۆژەش ئۆردوگای بەستۆرەش ئازاد کرا، لەو رۆژە تەق تەق راپەڕینو بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتن ، هەلنەستانی تیکڕای کوردستان لەیەك رۆژ نیشانەی ئەوەیە کە شاروشارۆچکەکان پیویستیان بە یەکتر هەیە و لە هەمان کات پیویستیان بە ڕینمای وسەرکردەوپیشمەرگە هەبوە ،دەنگی گەلی کوردستانی (ی ن ك) رۆلی هەرە بنچینەیی هەبوو لە 15ی مانگ ئەو دەزگایە بەستافەوە هاتنە ناو رانیەو لەوێ ڕێنماییەکانیان دەدا ، لە 3/11 شاری هەولێری پایتەخت لە بەیانیەوە لە هەمو لایەك هەلسان و لەسەعات (9)ی بەیانی ڕوویان لە بارەگاو دامودەزگاو دایەرەی (ئەمن و جەیشی شەعبی و ئەمنی تەواری و مەنزومەی شیمالی و بنکەکانی

پۆلیس و ...)کردو یەك بەیەك دەیانخستن ،تا ئێوارە سەرجەم ئەو بارەگایانە کۆنترۆل کران بە بارەگای سەرەکی فەیلەقی 5شەوە ، لەهەمان ڕۆژ راپەرین لەسەرجەم ئۆردوگاو ناوچەکانی دەوربەری هەولێریش گڕی گرتبوو، کەسنەزان و بنەصلاوە لەدارەتوو قوشتەپەو شاوێس و پیرزین و مەلا ئۆمەروجدیدەو تۆبزاوەوخەبات و ئاسکی کەلەك و کەورگۆسك و بەحرکەو بەرحوشتر... سوپای ناوچەکە خۆیان بەدەستەوە ،بۆبەیانی (3/12) پادگاکانی سەربەرزاییەکانی رەشکین و کانی قرژالەو رێ ی گوێرو مەخمور گیران دوای خودی مەخموریش ، بە ئاڕستەی بادینان هیزی یارمەتیدەر لە کەلەك پەڕیەوە بەرەو بادینان. لە 3/12 ئاکرێ و ناحیەی بجیل و سورچیایەتی و بەردەرەش و دینارەتی زێبار تادەگاتە شێخان و سەرزێ ی خازر ئازادکران ،لەبەرەی گەرمیانیش گەیشتە جەلەولا.

گەرمەی ڕاپەڕین دوو ئاڕستەی وەرگرت یەکیان بەرەو کرکوك ئەوەی تر بەرەو دهۆك ، لە 3/12 جەلەولا ڕاپەرین هەمان ڕۆژیش (خانەقین) ئازاد کراوپەڕیەوە بۆ ئالتون کۆپری وقەرە هەنجیروکمورو دەوروبەری کەرکوك، لە لای بادینانیش لە 3/13 جەماوەری زاخۆو دەروبەری ڕاپەڕین( کۆمەلگای هیزاوەو دەرکار عەجەم تا دەگاتە دەشتی سلێڤان و چیای بێ خێرو ژوێ و پشتی هەنگی رەخێ سۆرا) ئازاد کران ، ئەوەش مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە کە چۆن لەلای سۆران ڕانیە پیشڕەو بوە زاخۆش بۆ بادینان ئەو وەسفەی پیشڕەوایەتی هەبوە ،لەهەولیر بەرەو کرکوك شارۆچکەی پردێ ئازاد کرا ، لەگەرمیانیش کەلارو ناحیەی جەبارەو کولە جۆ ئازاد کران،لە 3/14 دهۆکیش هەمو دام ودەزگاکانی حکومەت وحزبی بەعس و دواتر لیواکەش خۆی بەدەستەوە دا، بە خیرایی پریشکی ڕاپەرین گەیشتە زاوێتەو مانگێش و باگێراو سەرسەنگ و ئەنیشك و بامەڕنێ و دێرەلوك و ئامێدی و سیریێ و شێلادزێ و باتوفەو بێ گۆڤاو.. تا دەگاتە کانی ماسی و ناوچەی بەروای بالاو ڕیکان بەدوو رۆژ کۆتایی هات وسەربازگەکانی گاراومەتین و شیرین و فاتێ و بارزان و بامەڕنێ بەبێ توندوتیژی خۆیان بەدەستەوە دا، لە 3/15 شارۆچکەی (سمێل) ی سەر ڕێ ی دهۆك ـــ موصل تافایدە ئازاد کردو، لە 3/16 لە مخمورەوە بەرەو کرکوك وسەربەشاخ و قەرەچوغی ئازاد کران ، لە 3/18 لە هەولیرەوە بەرەو کرکوك شارۆچکەی پردێ و دەوروبەریش ئازاد کرا، لە 3/19 لە 3لاوە بە ئاڕستەی کرکوك بەڕێکەوتن ، سلیمانی کرکوك ،هەولیر کەرکوك ،گەرمیان کرکوك ،لە ناوەخۆی کرکوکیش جم وجۆلی زۆر دروست بوو حکومەتیش خەلکیکی زۆری گرت ، نەخشەکە وابوو کە لە رۆژی نەورۆز شاری کرکوك ئازاد بکریت وەك نەوشیرەوان مستەفا (کە وەك

سەرکردەی ڕاپەڕین لەمەیدان بوو ) ڕایگەیاند، لە 3/20 ڕاپەڕین لەکەرکوك دەستی پێکرد بۆ ئێوارە و شەوی(3/21) لەگەل نەورۆز مژدەی ئازادکردن وسەرکەوتنی ڕاپەڕین لە کەرکوك جاڕدرا ، لەشێوەی فەیلەقی بەسرە سەربازگەی خالد بەشیکی کەوتە دەست ڕاپەڕیو بەشیکی مایەوە .

بەو شێوەیە ڕاپەڕین هەمو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە ،بەو شوینانەی تەعریبیش کرابوون .

## ڕاپەڕین ودیلەکانی عەرەب

کۆمەڵێك وەسفی ڕاپەڕین وکاری عەبەسی هەیە کە لەلایەن دورکایمەوە بە عەقلی جەمعی ناوزەدکراوە ، پێیان وایە خەڵکی مەیلی ژیانی مێگەلیان هەیە (نزعة القطیع)، بە تایبەتی لەکاتە هەلچوەکان، مەبەستی لەوەیە ئەگەر هەندێکیان (بەتایبەتی خەڵکە کاریگەریەکان) شتێك بکەن هەمووی بەدوایدا لاسایی دەکەنەوە، ئەو لە شۆڕشی فەڕەنسی تێبینی کردبوو کە بەڕەوە دەچوون پردێکیان دەشکاند کە خۆیان زەرەرمەند دەبون، یان بەڕەوە بینایان تالآن و وێران دەکرد[٨٤١]..بۆیە گەلێ جاروەسفی ڕاپەڕین وشۆڕش بە ناعەقلانی و عەبەسی کراوە ، لەوانە: نیتچە، گۆستان لوبون، بەشێکی تر بەدۆخی (لا شعوری-بێ هۆشمەندی) و هەتا بە (شێتانەو بەربەر)یش لە قەڵەم دەدەن، مالرۆ بە جۆریکی تر پێی وابوە هەر شۆڕشێك ئابووری نەبێت (**ثورة بلا سبب**)ة **یان** (ثورة لا عقلانیة)یە،. شۆڕش ئەخلاقی و ئاینی و مەبادیئی و عەقیدەیی و مانایەك نابەخشێ لەوانە خراتر (**بروتوکولات حکماء صهیون**) شۆڕش وڕاپەڕین بەسەگوەڕ هەژماردەکات[٨٤٢]، هەندێ زانای ئاینی تایبەتیش (عادەتەن پێیان دەووترێ سەلەفی لاجهادی) کەنزیکن لە دەسەلآتی سعودیە هەمان ئەو ڕایەیان هەیەو لایەنگیری شۆڕش و ڕاپەڕین ناکەن ،تەنانەت لەکاتی ڕاپەڕینەکانی بەهاری عربی بەردەوام فتوایان دژی ڕاپەڕین دەدا ،تەنانەت تاڕادەیەك ئیبن خەلدوونیش هەندێ جار شۆڕشی بە شێتانە لەقەلەمداوە،سیاسیەکانی عیراقی سەردەمی شۆڕشی بیستی عیراقیش وا ، لە یاداشتەکانی (جیمی کارتەر)ی سەرۆکی

---

[٨٤١] (مقدمە علم الاجتماع)، - دورکاریم.

[842] بروانە :پرۆتۆکۆلی (19)

ئەمریکی دەردەکەوێ پێش سەرهەلدانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان(لەسالانی 1977) عربی سعودی ترسی لەو بزوتنەوانە(شێت وشارانە) هەبوەو لای سەرۆکی ئەمریکی باسی کردوون[843] .

ئەو وەسفانە تەواو نیە بەلام جاروایە ئەو وەسفانە دێنەدی ،بەتایبەتی لە ڕاپەڕینە میلیەکان بڕیاڕی نامەعقول دراوەو جیبەجیش کراوە ، بڕیاڕی دەستە جەمعی لەکۆمەلگە ستونیەکان زۆر مەترسی دارە ،بۆیە مەرج نیە کۆڕای ئەوانە ڕاست بیت ،لیرەوە دەبی ووردتربین ڕای گشتی کۆمەلگەی مەدەنی وکۆمەلگەی ئاینی جیایە لەگەل کۆمەلگەی بەدەوی،بەهەمان شێوە کۆڕای کەسانی عەوام لەگەل ڕەوشەنبیر جیایە ،لەوەوە ئیمامی علی ووتویەتی (العوام..ینحنون بکل ریاح، اذا تجمعوا* ذروا و اذا انتشروا نفعوا..)، بەو شێوەیە رای گشتی عەوامی نەفام هەلْخەتاویە، ئیتر ناشێت ئەو جۆرە رایە بکرێتە بڕیاڕ ،کە زۆر جار کراوەتێ وبوویتە کارەسات .

ئەو بۆچوونە جیاجیانەی سەروو لە ڕاپەڕینەکانی کوردستان بەدی کرا ،لە هەندێ شوێن تالان وکاری عەبەسی کرا ،بەلام بەگشتیەکەی میلەت باش تر بوو لە بەرپرسان ، هەمو بەرپرسیکیش نا ،لەوانیش پۆلین هەبوو ،لەو چوارچێوەیە ئەوەی ڕادەبینرا کە خەلکی کوردستان تۆلە لەو سەربازو پلەدارانەی سوپای عیراق بکەنەوە ،چونکە هەر ئەو سوپایە بوو پیش دوو سالْ زۆر بەبێ بەزەییانە ئەنفالی کوردستانیان کرد ،زۆربەی ئەوانەی ڕاپەڕین کەس وکاریان ئەنفال کرابوو ، ژن ومندالیان بە زیندوویەتی ژێر گل کرابوو ، کەچی وانڕووی نەدا ، زیاتر لە 150000 ئەفسەر و سەربازی عەرەب و بەعسی بەدیل گرت، بە پیچەوانەوە ڕێزیکی زۆری ئەو دیلانەی سوپای عیراق گیرا ،لەخزمەت ونان وجل وبەرگ پێدان و .. ، دەرکەوت ئەو هەنگاوە بە بڕیاڕو ڕێنمایی سەرکردایەتیش نەبوو بەلکو ئەوەی پێی دەووترێ (ئەخلاقی کوردەواری) پاریزگاری لێکردن .

## شکستی ڕاپەڕین وقۆناغیکی نوێ:

---

[843] مذکرات جیمی کارتر –ت:شبیب بضون ص13.

* زانایانی ئەو سەردەمەش لە تەجەموعی عەوام تێبینیان کردوە جۆرە سلوك وهەلس وکەوتێکی نا ئاسایی دەکەن ،هەلچوون وبڕیاڕی هەلە دەردەکەن ،کاری وادەکەن لەتەنهایی وفەردی ئاوا ناکەن ،لەزانایانی ئەوروپی یەکەم کەس لەوبارەیەی کۆلیەوە(کۆستاف لیبۆن)بوولە کتابێك بەناوی (الجمهور)،بڕیاڕو ڕایەکی گشتی هەلە بەخێرایی بەرجەستە دەبێت.

کۆمەلێ هۆکار ڕێزدەکرێ بۆ شکستەکانی ڕاپەڕین لەوانە ئەو بیسەروبەریەو تالان و ناکۆکی حزبەکان وجاریش وایە گوایە پیلانی رۆژئاواو زۆری تر ،ئەوانە هۆکاری سادەن ،هۆکارە بنچینەییەکە ئەوەبوو بەو بارودۆخەی کوردستان:

گۆڕان لەسیاسەتی ئەمریکا لە دوای ریکەوتنی سەفوان و وەستانی جەنگ ،لە رۆژی 1991/2/16 پیش لیدان ج بۆش داوای لەگەل وسوپای عیراق کرد کە خۆیان دەسەلات بگرنە دەست وسەدام وحزبی بەعس لەناوببەن، کەچی لەدوای ڕاپەڕین ووتی (کاری بۆ ناوەخۆ نیەو ئیمە گاردی کۆماری لەناو نابەین )،لە 1991/3/28 دووپاتی کردەوە کە حکومەتی سەدام هەر دەکەوی بەلام ئیستا نا،بە پێی (یاداشتەکانی جیمس پیکەر)چوار هۆ وای کرد ئەمریکا سەدام لەناونەبات (1-نەوەك بەنەمانی عیراق شیعەو مەلایەکانی ئیران دەست بەسەر عیراق دا بگرن 2-ئەمریکا لەرزگارکەری کویت ببتە داگیرکاری عیراق3- دیارنەبوو ئەو داگیرکاریەش چەندە دەخایەنی و دەبوە هۆی بەکوشت دانی سەربازی ئەمریکی 4-پرۆسەی دیموکراسیش لە عیراق دروست نەدەبوو)[844]،بەلام بەپییی کتیبی(الخارج تحت الرماد) مانەوەی عیراق بەیەکپارچەیی ، ئەو کاتی ریتچاردهاس (راویژکاری بۆش بۆ کاروباری رۆژهەلاتی ناوەڕاست)ووتی مانەوەی سەدام باشترە لە پارچەپارچەبوونی عیراق بۆدەولەتی شیعەو دەولەتی کورد..

ئەوانە لەلایەك لەلایەکی تر بەهۆی تالان وهەندێ کاری تری عەبەسی متمانە بە سەرکردەو هیزی پیشمەرگە زۆر لاواز بوو، شکستی ڕاپەڕینی خواروو (شیعەکان) هۆکاریکی زۆربە هیز بوو،هاریکاریەکی وابە هیز لەنێوان کوردستان وخوارووی شیعە نەبوو .

هیزیکی گاردی کۆماری ئامادە مابۆوە هەر پرۆسەیەکی سەربازی .

هێزەکانی موجاهیدی خەلق لەو ساتە میژووییانە بەشداریان کردلە دژی هەردوو ڕاپەڕینی کوردستان وخواروو ، سونەی عەرەب وەك پیکهاتەیەکی دەسەلاتدار بەشداریان نەکرد بەلکو بوونەوە پشتیوانی هەرەگەورەی حزبی بەعس ..

دەتوانین بلێین دووبارە نەخشەی ڕاپەڕینی نوێ هەمان دیزاینی شۆڕش و بەرگریەکانی هاتنی بریتانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم دووبارە بۆوە ،چۆن ئەوکاتی کوردو شیعە بەرگریان لە (دارالاسلام)کردکە ئەو کاتی عوسمانی

---

[844] مجدى كامل- الحكام العرب فى مذكرات زعماء وقادة ورجال مخابرات العالم ص359-360.

خاوەنی ئەو داره بوو ،سونەی عربیش لایەنگری هیرشی بریتانیای کرد ،دوایش جاریکی تر شۆڕشی 1919ی کورد دژی بریتانیاو شۆڕشی بیستی خواروو هەلگیرسا ..ئەو دوو ڕاپەڕینەی سەروو و خواروو هەمان نەخشەو دیزاینی وەرگرتەوە ، زیاتر لەوەش ئەو کاتیش سەرکەوتن بۆ بریتانیا ولایەنگرانیان بوو لە سونەی عرب،ئەوجارەش شکست بۆ هەردوو ڕاپەڕین واهاتەوە ،هەنگاوەکانی شکست لە هیرشەکانی عیراق بۆسەر کوردستان بەو شێوەی خوارەوە بەرجەستە بوو :

سروشتی ڕاپەڕین وایە هەر ڕاوەستای نۆرەی هیزی بەرامبەر دێت ،واش هاتە دی ،بە بڕیاری بەرەی کوردستانی لەڕاپەڕین لە کوردستان ڕاوەستا، نەخشەی بەرگری یش نەبوو ،دوای سەرکەوتنی عیراق بەسەر ڕاپەڕینی خواروو ئیتر هیزەکانی عیراق ڕوویان لەکوردستان کرد ،یەکەم جار بەرەو کرکوك هاتن بە 6 فرقەی گاردی کۆماری بە هاوبەشی لەگەل هیزەکانی موجاهدینی خەلق[845]، لە 3/28 /1991 کەرکوك داگیر کرایەوە،کۆڕەوی لەوێ بەفەرمی دەستی پێکرد،لە 3/29 گەیشتە پردێ بە ئاڕستەی هەولێر لەهەمان ڕۆژگەیشتە قەرەهەنجیر بە ئارستەی سلیمانی ، بۆ3/30 گەیشتە قوشتەپەی نزیك هەولێر ، بۆ 3/31 هەولیریش گیراوەو گەورەترین کۆڕەو لەوێش دەستی پێکرد ،ئینجا هەمو کوردستان دەستیان بە کۆڕەوی کرد ، لەهەندێ شوێن پیش ئەوەی حکومەتی بگاتێ کۆڕەوی دەستی پێدە کرد .

<u>کۆڕەو وەرچەرخان (بۆ رەهەندی دەولی)</u>

کۆڕەو بەو کۆچە بەکۆمەلە دەووترێ کە لەکوردستان ڕوویدا لە دوای شکستی ڕاپەڕین ، بێئەوەی بەبڕیاڕێکی ناوەندی بێت بەلکو بە بڕیاڕێکی گشتی میلەت بوو ، دەری خست کە پیشمەرگەو میلەت یەك گیانە ،واتە میلەت بەرپرسیارەتی ڕاپەڕینی خستە ئەستۆی خۆی ،بە پیچەوانەی چەندجارە کە تەنها لە ئەستۆی هیزی پیشمەرگە هەژماردەکرا ، وێنەکان جیهانی هەژاند ، بوە هۆی دەرچوونی چەند بڕیاڕێکی نەتەوە یەکگرتوەکان و دۆزی کورد بچێتە دۆخێکی تری گەشەسەندوو لەسەر ئاستی دەولی ، هەنگاوە یاساییەکانی لە هەردوو نامەی

[845] بە پیی راپۆرتی حزبەکوردستانیەکان بەشداری موجاهدی خلق لە هیرش وئەنفالی کوردستان بەبەلگەیەو دەلێن ناویشی هەبوە بەناوی (ئۆپەراسیۆنی مرواريد)، لە بەیانەکانی ئەوکاتیشی هەردوو حزب(ی ن ك) و(پ د ك)و زۆر لای تر تەنانەت لەکتیبی( Rubin، Elizabeth (2003-07-13). "The Cult of Rajavi". *New York Times*. ) دەلیت مریەم رەجەوی رینمایی داوە : بەگولە کورد مەکوژن بەلکو بیانخەنە ژێر دەبابە باگولەکان هەلگرین بۆ کوشتنی پاسداران .

کۆماری ئیسلامی ئێرانی له 1991/4/4 به مۆری (کەمال خەرازی) تورکیاش لە 1991/4/3 بە مۆری (موستەفا ئکسین) بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان نێردرا له بارەی ئەو کۆڕەوە ، فرنساش تەبەنی ئەو دۆسیەی کرد ، بەو شێوەیە لە دانیشتنی ژ:2982 ئەنجومەنی ئاسایش لە 1991/4/5 بڕیاری ژ:688 دەرکرد تیایدا لەمادەی(2) ئەو بڕیارە فەرمان لەسەر عیراق دەکا کە هەرچی مەترسی هەیە لەسەر هاولاتیان دەبێ لەناو ببرێ و سوپاکەی هەڕەشە نەبێ لەسەر کورد،لەو بڕیارە ئیدانەی عیراقیشی تیابوو ، ئەو بڕیارە بەکۆی دەنگ جگە لە(کۆبا،یەمەن،زیمبابۆی) ، بەدوای ئەو چەندبڕیارێکی تردەرچوو لە 1991/4/16هیلی دلنیایی 36 بەرجەستە بوو کەنەتوانی فڕۆکەکانی عیراق لەسەرووی ئەو هێلە بپەڕێتەوە ، قۆناغێکی نوێی بۆ کوردستان وێنە دەکا .

ئەوەی ئەو جارە وایکرد ڕاپەرینی 1991 سەرەنجامی هەبێت چەند خالێکی بنچینەیی بوو:

**یەکەم:** لاوازی حکومەتی عێراق**،** لەجەنگی کوێت شکستی هێنابو، ئابلۆقەی ئابوری سەپێندرابوو ( بەپێ ی مادەی 39 بەندی حەوت) ، هێزی سەربازی لاوازبوو، نزیکەی 40 بڕیاری نێودەولەتی بەسەردا سەپێندرابوو، پەیوەندیەکی ناوەکی و ئیقلیمی و عەرەبی و جیهانی زۆر لاوازبو،

**دووەم:** لەسەر ئاستی جیهانیش یەکێتی سۆڤیەت هەلۆەشایوە و سیستەمی جەنگی سارد و هاوسەنگیەکەی تێکچوو، وای کرد ولاتی یاخی وەك عیراق نەتوانێ هەموو کردارێك بکات.

بەو شێوەیە ڕاپەڕینەکە ڕەهەندی دەولی وەرگرت و تائیستاش بەردەوامە .

<u>**شەڕی کۆڕێ ودانوستان**</u>

هێزی پێشمەرگە و چەکدارانی جەماوەر خراپ شکستیان هێنا، تا لە1991/4/7 و 4/11 دووشەڕی گەورە لەکۆڕێ ولەدەربەندی هیزۆپ و بازیان و...هتد کراو بەر بە هیرشەکانی حکومەت گیرا ، لە کۆڕێ لەئەنجامی شەرێکی قارەمانانە توانیان بەر بەو هێرشەی بەعس بگرن و یەکسەر دەرگای دانوستانیش کرایەوە،هەروەك سەرۆکی (پ د ك)دوو دلّ بوو لە ڕاپەڕین بەهەمان شێوە لە دانوستانەکەش دوو دلّ بوو ،ئەگەر لەیەکەما کەمێك بەهەلەداچزبێ بەلام لەدوەما بۆچوونەکەی ڕاست بوو ،ڕازی بوونی سەرکردایەتی کورد بەو دانوستانە کوزارشێکی ڕوون بوو کە بەتەواوی

ئاگاداری باری نێودەولەتی وقۆناغی نوێی دۆزی کورد نەبوون ، گرنگی بڕیاڕی 688 و قۆلبەستی عیراق بەهۆی بەندی 7 لە میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و ڕووخانی سۆڤیەت وقۆناغی دوای جەنگی سارد لەسەر ئاستی جیهانی ..،هەمو ئەوانە دوای کەمێك لە کرانەوەی کوردستان بە ڕووی جیهان بۆیان دەرکەوت ئەو دانوستانە لەگەل عیراق چەندە هەلە بوە ، چەندین مشت ومڕلە نێوان (پ د ك)و (ی ن ك) سەری هەلدا لەبارەی (ڕۆلی کام حیزب لەو شەڕیکۆڕێ گرنگ بو)کام حزب ڕۆلی بنچیەنەییان هەبوە لە ڕاپەڕین ؟کام حزب ڕۆلیان هەبوە لە هەلگیرسانی شۆڕشی نوێ ؟ لەگەل زۆر تەوەری تر، زۆربەشیان لەلای (ی ن ك)ەوە دەست پیشخەری ئەو جەدەلانە دەکرا،

لە ڕاستیدا لەدوای هەر سەرکەوتنێك ئەو مشتومڕە دێتەکایەوە کە کێ خاوەنیەتی یان کێ رۆڵی زیاتر بووە، ئەگەر سەرکەوتن نەبێ و هەنگاوەکە شکست بێنێ کەمتر ئەو جەدەلە بەدی دەکرێ، لەبارەی ئاخۆ کێ ڕاپەرینی کرد، لەنێوان حزبە کوردستانیەکان خۆبەخۆ و لەلایەکی ترش ئاخۆ هێزی پێشمەرگە یان میللەت خۆی تا ئێستا بە ئەکادیمی و فەرمی ساغ نەکراوەتەوە، هەر لایە و خۆی پێشکەشی دەکا.. بەلاّم ئەوەی لەچوارچێوەی مەوسوعەیەك دەتواندرێ بووترێ ئەو خالاّنەی خوارەوەیە:

یەکەم: هەموو حیزبەکان و میللەت پێکەوە بەشداریان کردووە ، بەلاّم ناکرێ بلّێ ی هەموو وەك یەك، ئەوە وەلاّمە بەلام وەلامی هەلّاتنە.

دووەم: هیچ گومانی تێدانیە ئەوەی زیاتر رۆلّی بینی ( ی ن ك) بوو، باش ترین بەگەلّگەش ئەوەیە لەناوچەکانی نفوزی ئەو سەری هەلّدا.

سێ یەم: رۆلّی حیزبەکانی تریش (بزوتنەوەی ئیسلامی، حیزبی سۆسیالیست، حیزبی شیوعی) گرنگ بو بەلام پێشڕەو نەبووینە، بەتایبەتی بزوتنەوە رۆلّی لەچاو ساواییانە لەهەندێ دۆخدا پلەی دووەمیان هەبوە، هەرچی ( پ د ك) ە لەچاو سەروەریەکانی لەمێژوو و تەمەنیدا بەو شێوەیە نەبوە دوو دلّیان پێوە دیاربوە، خالی لاوازیان زۆر بوو ،خالّی بەهێزی (پ د ك) دیسان بوونی خودی سەرۆکی حیزبەکە (مەسعود بارزانی) لە ڕاپەڕین ودوایش لەناوجەرگەی شەڕی کۆڕێ وای

کرد سەروەری بدا بە ( پ د ك) ، ئەگینا بوونی هێزی پێشمەرگەی ( پ د ك) زۆر لاواز بوو لــەو شەڕە، (کەریم ئەحمەد-سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان) لە کتێبی (المسیرە) دەڵــێ: لــە کــاتی ئەوشــەڕە (کــانبی گــەورەم) بینــی 60پ م شــیوعی لەگــەڵ بــوو، دوای رســول مەمەنــدی سۆشیالیستیشم بینی لێم پرسی ئاخۆ چەندی بۆ ئەو هێرشە پێ ئامادە دەکرێ؟ ووتــی80 پ م، چوومە لای کاك مسعود لێم پرسی چەندت پێ ئامادە دەکرێ؟ ووتی ئیستا 12پ م لەگەڵ ماوە ئەگەر پێیان بلێم خۆتان بۆ شەڕئامادە بکــەن ئــەوا بەتــەنها دەمێنمــەوە[846]، بــەپێی ڕای کــریم ئەحمەد کاریگەری حزبــەکان لــەو شــەڕە بــەو ڕێــزە دێــت (الإتحــاد الــوطني و الشــیوعي والحرکــة الإسلامیة وسوسیالیست والبارتي في دربند کوری - المســیرة ص266 ) پارتی خســتۆتە هــەرە دوای ،ڕەنگە یەکجار وانەبێت چونکە لە شــەڕی کــۆڕێ ســەرۆکی پــارتی خــۆی سەرپەرشــتیاری هێزەکانی پێشمەرگە بوو، کە بە پلەی یەك (ی.ن.ك) لەوێ بوو، ئینجا پــارتی و بزوتنــەوەو دوای ئەوانیش سۆشیالیست و حزبی شیوعی.

خاڵی هەرە بەهێزی ئەوەبو کە خودی سەرۆکی پارتی هاتبوە مەیدان لەگەڵ جەماوەربوە، هەر لەسەرکەوتنەکانی شار بەشار تا ڕزگاری کەرکوك و دوایش شکستەکانیش تا شەڕی کۆڕێ، لەوە و هەرچی کەموکوڕی و کەم ڕۆڵی ( پ د ك) عەیب بڕی کردووە، بەگشتی ( پ د ك) نەیتوانیوە وەك ( ی ن ك) لەشاخ و بەرگری بەهێز بێـ،بەڵام شەعبیەتی لە( ی ن ك) باشتر بووە، هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ خودی (مەلا مستەفا) کە لەناو خەڵکی کوردستان زۆر خۆشەویست بووە، هەر لەکاتی ڕاپەرین و لەشاخیشدا وا هەست دەکرا پێشمەرگە و بەرپرسانی ( پ د ك) زیاتر ڕێزی هاوڵاتی دەگرن، تەنانەت لەڕاپەرینەکەش ( ی ن ك) ڕۆڵی بنچینەیی هەبوە بەڵام پەروەردەی بەرپرسانیان زۆر لاوازبوە دەستیان بە تالانی دامودەزگای حکومی خەڵکی توشی شۆك کرد، کەمتر بەرپرسانی (پ د ك) بەو کارە ناشرینە هەستان، ئەوە جارێکی تر متمانەی میللەتی بۆ پارتی نوێ کردەوە، هەرچەندە لەدەستپاکی بزوتنەوەی ئیسلامی یەکەم بوو، بەهۆی ئەوەی بزوتنەوەیەکی خاوەن قەزیە نەبوون نەیان توانی ئەو قارەمانیەتی و پاکیەیان ببێتە هۆی ئەوەی پلەیەك لەپێشەوەی میللەت بەدەست بهێنن تا

[846] کریم احمد –المسیرة ص 265–266 .

ئەو ساتەش هەر بەو دەردەوە دەناڵن، بەو شێوەی دێزاینێك بۆ حزبەكان لە قۆناغی نوێی كوردایەتی چەكەرەی كرد.

رِاپەرِینی دوەم و حكومەت وپەرلەمانی كوردستان

دانوستانەكەی حكومەتی بەعس وكوردستان چەند مانگیكی خایاند ، دوو خولی گفتوگۆ كرا لە:20-1991/4/28 لەدوەمیشالەمانگی 5و1991/6 ، حكومەت بە هەمو دام ودەزگاكانیەوە لە هەر چوار شاری كوردستان جیگیر ببۆوە ،بەرەبەرە هێزی پیشمەرگە خۆی دەخزاندەوە ناو شارەكان بەتایبەتی (ی ن ك)،وای لێهات هەردوولالەناو شار بوون ، بەرەبەرە (ی ن ك)لە دانوستان دوور كەوتەوە زیاتر (پ د ك) پابەندی بە بنەماكانی دانوستان دەكرد ،جۆرێك لە متمانەی لە نێوان پارتی وحكومەت دروست ببوو ،بە پیچەوانەی ئەوەی لە یەكەم سەردانی (مسعودبارزانی )بۆ بەغدا جەماوەری پارتی رِێگەیان لە كاك مسعود گرت لە گەلی علی بەگ بۆ ئەوەی نەچێت ،خۆشی زۆری بەدلی نەبوو بەلام فشاری مام جلالی لەسەر بوو تابچێت ، كە چوو وەك ئەخلاقی سیاسی نەیان ویست دۆخی دانوستان و بریاری 688 وهیلی 36 لەدژی حكومەتی بەغدا بقۆزنەوە كە (ی ن ك) وای دەكرد، حكوومەتی عێراقی بەكۆمەلێك برِیاری UN كوت وبەند كرا سەرجەم گەیشتە 40 برِیار، یەكێتی پێی وابوو دانوستان لەگەلی زیانە نەك قازانج، ئەوەش یەكێكی تربوو لە ناكۆكیەكانی هەردوو حزب .

ئەوەی لەجاری دووەم شكۆی دەسەلاتی بەعسی شكاند لەناو شارەكان ئەو موجازەفە گەورەیەی مام جەلال بو لە سەرەتای هاوینی 1991كە لەرِێگای قاچاغ(دۆلی ئەسحابان—دەربەند-بنەسلاوە) هاتە ناو هەولێر لەناو گۆرِەپانی وەرزشی هەولێر وتارێكی مێژوویيدا ، جارێكی تر دەسەلاتی حكومەتی بەعسی لەناو هەولێر لاوازكرد و هێزی پێشمەرگەی زاڵ كردەوە، لەئەنجامدا جارێكی تر رِاپەرینێكی سەربازی دژی دام و دەزگا سەربازی و ئەمنی لەدژی حكومەتی عێراق كرا و لە كوردستان دەریان كرد، پاشان پێ بەپێ لەشارەكانیش لە(1991/10/7) دامو دەزگاكانی رِژێم كشانەوەوئیدارەی كوردستان كەوتە بەردەستی لایەنە كوردیەكان لە بەرەی كوردستانی ، بەڵام ئەوجارەیەكان كەمتر جەدەل هەڵدەگرێ هێزی پێشمەرگەی ( ی ن ك) بەو كارە هەستا.

یەكێتی ئەركێكی قورسی كەوتە ئەستۆ لە هەڵچوونی جەماوەر و نەبوونی بەرنامەی ئیداری پێشوەخت و نوقستانی كادیر.. هەتا خودی یەكێتیش بەرزەفت نەدەبوو، بەڵام دیسان كلیلی

چارەسەریەکانی لە بوونی (ڕێکخستن) دۆزیەوەو دەستپێشخەری بوێرانەی کرد و خۆی کردە خاوەنی ئەو راپەرینە، یەکەم کۆنگرەی یەکێتی لە هەولێر سالّی 1992 گرێدرا، گرنگترین هەنگاوەکانی:

1- هەردوو باڵی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕانی هەڵوەشاندەوە لەناو یەکێتی.

2- ئایدیولۆژی گوری وشۆسیال دیموکراسی هینا جێی مارکسیەت.

3- لەبەر سەروەری یەکێتی ناوەکەیان هێشتەوە.

کارمەند و ماموستایان هاتنەوە قوتابخانە بەبێ مووچە ئەرکیان بەجێ دەگەیاندلە سەرەتای ئیدارەی کوردستان لە1991- 1992، بەلاّم بەرپرسانی حزبە دەسەلاّتدارەکان لەو ساتیشدا خەریکی کۆکردنەوەو تالاّن بوونتنی کەل وپەل بوو بە ئێران ، مسعودبارزانی زۆر بە توندی دژیان وەستا و ناویانی بە "مافیا" بردن ، بەلام یەکیتی و مام جلال زۆر لەو خەمە نەبوون و بە زەردەخەنەوە لەووتارەکانیان بە هیزی ئاڕئاڕ ناوزەدی دەکردن ، لەدوای هەندێ کێشەی ئیدراری و ناهاوسەنگی (بەرەی کوردستانی) ڕێککەوتن لە5/19/ 1992 هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت و یەکێتی وای رادەبینی کە بەڕێژەی 70٪ی دەنگەکان بەدەست بهێنێ، لەگەڵ حزبی (زەحمەتکێشان) بەلیستێکی هاوبەش، کەچی 43.8٪ی دەنگ بەدەست هێنا سەرەڕای هەندێ تەزویر (14046) دەنگی لە پارتی کەمتر هێنا ، (پ د ك)یەکەم دەنگی هێنا

یەکێتی بەو ئەنجامە قایل نەبوو،پارتیش لە بەر بێهێزی ناچار تەنازولی کرد، بۆیە ڕێککەوتن حکومەت و پەرلەمان (50 بە 50) دابەش بکەن،حکومەت بۆ یەکێتی و پەرلەمانیش بۆ پارتی،بەلاّم لە ڕەوتی ئیداری دەرکەوت لە ئەنجامی لێهاتوویی زیاتری یەکێتی زۆربەی جومگە سیاسی وياساييەکان لەدەست (ی ن ك)بوو ، سەرەڕای ئەوەش یەکێتی بەوەش قایل نەبوو دەستی بەشەڕی براکوژی کردەوە لەگەل بزوتنەوەی ئیسلامی ودوایش لەگەل (پ د ك) .

**(29)**

## - سيوكراتى الثيوقراطية Theocracy

**ئەوانەش دەگريتەوە (حوكمى ئاينى ،ساتۆكراسى ،ڕێپيدراو ،ئۆتۆكراتى ،سايزوكراتى، ،سيزاريزم، حكم الكهنه،كالڤنى، عصر الظلمة، (Divine right of kings) يان ( الحق الإلهي للملوك–jure divinoe ، مۆنۆكراسى، ثيۆديمقراطية،jus primae nocti ،** هيتارى،ئۆريلى،مۆناركى ،اباء المؤسسين، حرس القديم ،گرنۆتۆكراسى..)

سيۆكراتى (θεοκρατία) زاراوەيەكى يۆنانى زۆر كۆنە لە ناوەڕۆكدا، لە دوو بڕگە پێكهاتووە (سيۆ) واتە خودا (كرات) واتە حوكم، حوكمى خودا لەسەر زەوى، فەرمانرەوايى خوايى بۆسەرخەلك، خودا حوكم لە ئاسمان دەكا ئەگەر زەويش لەڕێ ى ئەو (حوكمە، ئيمپرارتۆرە، سەرۆكە) حوكمى خوا نەكا ئەوە زەوى بە ياخى و سەرپێچ لە حوكمى خودا هەژماردەكرێ، واتە حوكمى خوا لەسەر زەوى ،پيشووتر بەو جۆرە حوكمە پيرۆزانە دەووترا(ئۆريلى )بەزمانى يۆنانى ماناى خوايى پيرۆز يان كەسيكى پيرۆز ودەسەلاتدار،بەو شێوەيە ڕەگى حوكم زۆر پتەو دەبوو.

كۆن ترين شێوەى دەسەلاتە ،بۆيە گوزارش كراوە بەناوى جياجياى وەك قەيسەرو خەليقەو سولتان وئيمپراتۆرو ...، زۆربەى ئەوانە بەشيك بوە لە بەكارهينانى ئاين لە پيناو گەيشتن بەدەسەلات و مانەوەيان لێى ،زياتر بەو دەسەلاٌتانە ووتراوە كە ڕاستەوخۆ بەناوى خودا حوكميان كردووە،واتە بەرامبەر خودا بەرپرسيارە نەك خەلك، لە ئەوروپا زياتر مەبەستيان حوكمى ئاينى يەهودى ومەسيحى بوە،كە لە سەدەكانى ناوەڕاست سەرى هەلداوە وزياتر بەسەدەى تاريكى ناوزەد دەكرێت ، دەلێن قوستەنتينى يەكەم بەر لەهەموان ووتويەتى ئيمپراتۆرو پاشاكان نوێنەرى خودان لەسەر زەوى،ناكرێ گوێڕايەليان نەكريت،لەو سەردەمى ئازادى و معارەزە بوون و ياخى بوون دەبيتە

تاوانیکی واگەورە کەس نەتوانی بەرگری لێبکا ، ئەوەش دەبیتە هۆی دواکەوتن وزۆرداری کەمتر ڕوو لە ئاینی ئیسلامە، یەکەم کەس کە ئەو زاراوەی داهێناو بەکاری هێنا (جۆزیف فلافیۆس) ی یۆنانی(یەهودی) بوو لەسەدەی (1)ی زاینی ،کاتێ بینی سێ جۆر دەسەلات لە یۆنان کاری پێدەکرا ، پادشایی(مۆنارکی بەزاری ئەرستۆ) وئەرستۆکراسی وسەفسەتایی ،هەرچی دەسەلاتی یەهودی تایبەت تر بوو زیاتر بەلای حوکمی خودایی بوو، فلافیۆس ناوی لەو جۆرە دەسەلاتە نا سیۆکراسی وەك چوارەم شێوەی دەسەلات .

دوای ووردبوونەوەی تر واپێدەچی لەپیشووتریش ئەوزاراوە بەکارهاتبێت، ئەگریکیەکان لە سەردەمی پتلیمۆسی یەکەم لەمیسر جۆرە خواپەرستیەکی تریان لە یەکگرتنی سێخودا داهێنا ، پێیان دەووت ( إتحاد الآلهه - سیوکراشی-Theocrasia ) لە پەرستگایەك بەناوی سەرابیۆم ، زۆر نمونەی تری مێژوویی بە ڕوونی دەری دەخا بەکارهێنانی سیۆکراتی زۆر کۆنە .

مەوسوعەی لالاند پێی وایە لەگەل بەکارهێنانی زاراوەی دیزم زاراوەی سیۆکراتیش بەکارهاتوە ، یەکەم جار وەك زاراوە (ڤیریە) لە بەرگی دوەمی کتیبەکەی( instraction chritiemt ) لەسالی 1564 بەکاری هینا و بە عەسابە وەسفی کردوون ،لەدوایدا سوکنیەکان بەکاریان هیناوە بۆ جیاکردنەوەیان لە مولحیدەکان ،پاسکال دەلێ مسیحیەتی ڕاستەقینە هەردوولای(مولحیدو دیزم) ڕەتدەکاتەوە[847]، ڕەتکردنەوەیان مانای حوکمی سیۆکراتی دەبەخشێت .

لەوسەردەمە جاریکی تر لەگەل ڕابوونی ئاینی وحزبی ئاینی بەتایبەت بزوتنەوەی ئیسلامیەکان چۆنیەتی پەیرەوکردن شریعەتی ئیسلامی ئەو زاراوەیە سەری هەلّدایەوە، تەوەرەکانی سەرەکی بریتیین لەوەی ئاخۆحوکمی ئیسلامی بریتیەلە حوکمی راستەوخۆی خواوەند؟ ئەوەی حوکم دەکا نوێنەری خواین وراستەوخۆ پەیوەندیان بەخواهەیە واتە ئەوانەن لەپێناوی نێوان خوداو ئادەمیزاد؟ ئەوانە مەعسومن نابێ کەس رەخنەیان لێ بگرێ...؟یاخود وانیە وحوکمی ئیسلامی حوکمێکی مەدەنی وبەشێکەلەگرێبەستی نێوان حاکم ومەحکوم, نێوان هاولّاتی ودەسەلّات, ئەوانیش وابەستەن

---

[847] موسوعه لالاند الفلسفیه ص257 .

بەدەستورێك كەلەلایەن خەلكەوە دیاری دەكرێت، بەگشتی پرسیارە بنچینەییەكە ئەوەیە ئاخۆ پەیوەندی خوای گەورەوە بەبونەوەر وئادەمیزاد لەرێی پێغەمبەرانە یان لەرێی یاسای سروشتیە یان لەرێی ئادەمیزادی تری وەك ئیمراتۆرو شێخ وئیمام و وەلی؟ وەلامی ئەو پرسیارەو لێككردنەوەی جەوهەری ئەو بابەتەیە ..ساغ كردنەوەی ئەوزاراوەیە بۆئەوسەردەمە زۆرگرنگە لەرووی سیاسی وفەرهەنگی ویاسایی فكری وعەقیدەی وفەلسەفی و ، تاڕادەیەك مشت ومڕی سیاسی و فلسفی و هزری زۆری لەسەر كراوە لەبارەی پۆلین كردنی دەسەلاتە میژووییەكان و سروشتی بزوتنەوە ئاینیەكانی ئەو سەردەمەو تا دەگاتە بناغەكانی سیكولار وپەیوەندی ئاین وژیان وسیاسەت دەگریتەوە ،بۆیەش پیناس وبۆچوونی جیاجیا هەلدەگرێ ، هەندیك لەپیناسەكانی سیۆكراتی تۆماردەكەین :

+پیناسی گشتی (سیۆكراتی):سیستەمێكە پالپشت دەكاتە ئایدیۆلۆجیای ئاینی مسیحی ویەهودی وماناكەشی بریتیە لە حوكم بە پێی ڕێنماییە ڕاستەوخۆكانی خودا .

+ Devine Right Theory":دەسەلاتیكی پیرۆزە ڕەوایی لە خواوە وەرگرتوە، لە سەرووی لیپیچانەوەیە[848]

+ مەوسوعەی ستانفۆرد:لە ڕوانگەیەكی فلسفی پیناسی دەكات ودەلیت : یەكخستنی دەسەلاتی ئیمپراتۆری وئاینیە .

+Amodern Dictionary Political Analiysis : دەلی سیۆكراتی مانای (حكومە الدینیە) ، ودەلێ شیوەیەكی دیكتاتۆری دەسەلاتە[849] ..

+ الموسوعة الحدیثة للمصطلحات:دەلێ بریتیە لە دەسەلاتی پیاوانی ئاینی ..بە سەردەمی تاریكی وەسفی كردوە [850]

---

[848] Devine Right Theory−Haq,1969,p55

[849] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts - p453

+فەرهەنگی سیاسی(ئارش) :تیۆریکی سیاسی وئاینیەوپێیوایەتەنیاحکومەتی ئاینی حکومەتیکی ڕەواویاساییە، ئەو یاسایە کەلەلایەن خوا داپشتراوە و پیغمبەرانیش بەخەلکیان ڕاگەیەندوە[851] .

+ الموسوعە الميسرە:دەلی مادام دەسەلاتی دنیای بەدوای دەسەلاتی روحی بوو ئەوە سیۆکراتیە[852] .

+قاموس السیاسی (شیوعی): شیوەیەکە لەدەسەلات ،تیایدا هەردوو دەسەلاتی ئاینی ومەدەنی دەکەویتە دەست یەك کەس[853].

+فلسفه الدوله:هەندێکی تر پێیان وایە هەمو ئەو دەولەتە ئاینیانە دەگریتەوە مادام پێیان وابی سەرچاوەی فەرمان ڕەوایی بۆ خوا دەگەرێتەوە [854]

+دائره المعارف: ڕاڕەویکی حوکمڕانیە کە سەرچاوەکەی بۆ خودا دەگێڕێتەوە ،دەلی(**اللة مصدر السلطة**) خوا لە ئاسمان وسەرۆکیش سیبەریەتی لەسەر زەوی .

+ موسوعە لالاند: ئەو مەوسوعەیە پیناسێکی مادی سروشتی پێداوە ودەلیٚ (**دیزم تألیە الطبیعی**) واتە دیزمی ئەو جۆرە حوکمەیە کە یاساکان لە سروشت وەردەگریت هەرچی سیۆکراتیە پێی وایە حوکم لە خودا وەردەگیرێ[855] .

+ الموسوعة المصطلحات السياسية: هو النظام الذي يستند الى فكرة دينية ، ومنها نظرية (الحق الإلهي) التي تعتبرأن الله هو مصدر تأهيل هذا النظام ،والحاكم بمثابة ظل الله أو وكيله على الأرض.

+ التيوقراطيّة: لغةً حكومة اللّه واصطلاحاً نوع من نظم الحكم يجمع فيه الحاكم بين السلطتين الدنيويّة والروحيّة[850].

---

[850] الموسوعة الحديثة للمصطلحات السياسية والاقتصادية ص85

[851] فەرهەنگی سیاسی(ئارش) و:زاهیر محمدی ل93.

[852] الموسوعه الميسرەللمصگلحات السياسيه ص249

[853] یوری ماریوف –القاموس السياسي ص104

[854] دمنذر الشاوی– فلسفة الدولة –ص56

[855] موسوعە لالاند ص257

+ موسوعه مصطلحات سياسيه شامله: نظام يستند إلى أفكار دينية مسيحية ويهودية ، وتعني الحكم بموجب الحق الإلهي .

+ المعجم الشامل: هي الحكومة الدينية أو التي تغلب على حكامها النزعة الدينية أو التي تقول بحكم الله (عزوجل) وتطبق الشريعة التي ورثتها بدلاً من القانون الوضعي, فهو النظام السياسي الذي يستند إلى سلطان إلهي, ومنها نظرية الحق الإلهي التي تعتبر الله (جل وعلا) مصدراً للسلطة, والحاكم ظل الله (تعالى عن ذلك) على الأرض أو مفوض السماء[857],

بيروراى هرمسى كۆن : فالسلطة الزمنية تستمد مقوماتها من المشيئة الإلهية ، ويتم اختيارها بعناية وتوجيه منها .

+government by divine guidance or by officials who are regarded as divinely guided. In many theocracies, government leaders are members of the clergy, and the state's legal system is based on religious law[858]

حکومەتی خوای و پیکهاتو لە پیاوانی ئاینی ،سەرچاوەی یاسایشی ئاینی بیت .

<u>ریشەو ئەزمونی سیۆکراتی:</u> جاران خەلکێکی زۆر وا تێگەیشتبوون کە خودا یاساکانی خۆی دابوە دەست حکومەتەکانی سەر زەوی، ئیمپراتۆرو پادشاکانیش لە جیاتی خودا حوکم دەکەن، بۆیەش رۆسۆ دەلێت لەسەرەتادا هەرگیز پادشاوسەرۆك نەبووینە ئەوەی هەبوە خوای سەرزەوی (حکومەتی ئاینی وسیۆکراتی)هەبوە[859] ،ئەو بۆچوونانە بنچینەیەکی فلسفی و فقهیشی هەبوە(لە خواروو باسی دەکەین)، واباوە کە (هۆمیریۆس) ووتویەتی سیستەمی سیۆکراتی(پیش سەرهەلدانی زاراوەکەش)لەوە دەهات کەسەرۆك پێشدەکەوت دوژمنەکانی دەشکا ، وای لێدەهات خەلکی وابڕوا بکەن کە ئەو

---

856 معجم الفلسفه ص15

857 عبدالمنعم ألحفني, المعجم الشامل ص241

858 Encyclopædia Britannica –Article: Theocratic

859 رۆسۆ –فى العقدالاجتماعى ص201

سەرۆکە پیشبینی وغەیبی هەیە ،وەك مرۆڤی ئاسایی نیە ، دەشلێن پادشا قوستەنتینی یەکەم جار ئەو پاگندەیەی کرد و ووتی: ئیمە نوینەری خواین لەسەر زەوی، ئیمە لە جیاتی خودا لەسەر زەوی حوکم دەکەین،هەندیك دەڵین لە بنەچەدا ئەو زاراوەیە لەئەزمونە دەسەلاتی ئەگریکی دێت لە میسر بەناوی (یەکخستنی خواوەندەکان)لەسەردەمی بەتلیمۆسەکان، هەرچی (موسوعە المیسرە..)زاراوەیەکی تری بەکارهێناوە بۆ تەواو کردنی سیۆکراتی پێی دەوترێ (سیزاریزم-ceasrism)واتە حکومەتیکی جیهانی وگەردوونی لە خزمەتی کۆمەلگە بە پالپشتی ڕێپێدراوی خوای دروست بکەن ،نمونەش بە دەسەلاتی (یۆلیۆس قەیسەر) هێناوەتەوە[860]، بۆهەموشیان دەرچوون لە فەرمانیان دەرچوون بوو لە فەرمانی خودا ،ئەو مافە تایبەت بوو بە بنەمالەی شا ،ناوی هەبوو(Divine right of kings) یان ( الحق الإلهي للملوك) ،ئەوەش لەلای خۆی چەمکیکی تری ئاینی تەواوکەری سیۆکراتیە ،بەهۆیەوە درێژەیان بە دەسەلاتی خۆیان دەدا لە پەنای ئاین ونەزانینی خەلك لە بارەی ئاینەوە ،ئەو جۆرە دەسەلاتانەش یەکسەر بەرەو دیکتاتۆریەکی توند دەڕۆیشت ،بەرەو کاری تری ترسناك دەڕۆیشت وەك مافی شەوی یەکەم لە بووکێنی دەبوایە بۆ پادشا بوایە ،ئەوجا بەبەر نەدەکەوت ،واسیتە دەکرا کە بووکەکەیان زوو نۆرەی بیت تا بیگۆزنەوە ،جاریش وابوو بە فەرمانێك ئەو کارە بە پیاوانی ئاینی دەسپێرا ،ویستر مارك دەلێ ئەو کارە بەردەوام بوو تاسەدەی17 ،مافی هێنانی بووك لە شەوی یەکەم بۆ پیاوانی ئاینی وشاو بەرپرسەکانیان ناونرا بوو( jus primae nocti)[861] ،جارجاریش دەدرا زاناو فەیلەسوفانی سەر بەدەسەلات،ناوی ترابوو (هیتاری)،لەو بارەیەوە (مالکۆلمی سێیەم —شای ئیقۆسیا)بڕیارێکی فەرمی لە(١٠٥٧ - ١٠٩٣)ز دەرکرد تیایدا مافی شەوی یەکەمی بووکێنی پیاو ماقوولانی قۆرخ کرد بۆ خۆی و جێنشینەکانی ،بەلاّم بووکی مالە هەژارەکان بەر ئەوانی تر بکەوێ ،دوای (مالکۆلمی چوارەم (1141-1165)لە ژێر فشاری ژنەکەی ئەو یاسایەی هەلوەشاندەوە ،هەندێ جار وەك خەلاّت هەندی کەس لەوە دەبووردران وشەوی یەکەم ولادانی پەردەی کچێنی بۆ زاوا خۆی دەمایەوە ..کەواتە لەوەوە بۆمان

---

[860] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص142 و 249

[861] بڕوانە: Gorg orwel –Ninteen Eighty Four p67

دەردەکەویَ کەئەو نەریتە لە ئەنجامی زۆر داری داهاتوە نەك لەبەر نەبوونی گرنگی پەردەی کچێنی وەك هەندیَ توێژەر وا دەڵێن .

لە سەدەی (19) سیستەمیکی تر لە سیۆکراتی گەشەی پیدرا وپێیان دەووت (ئیلهامی سیاسی- political inspiration) گوایە ئەو جۆرە سەرۆك وپادشایانە رینمایی وزانیاریان لە غەیبەوە بۆ دێت ،نابی ڕایەکەی رەتبکریتەوە یان مناقشەی بکریت راویژی ناویت (هەر خۆی دەزانی چ دەکا) ، ئەوەش نزیکە لەو بۆچونەی هۆمیریۆس باسی دەکا(لەسەروو باس کرا) .

بەو جۆرە دەسەلاتانە (لە ڕووی ئەکادیمیەوە )ووتراوە(Devine Right Theory –**نظريةالتفويض الإلهي** ) دەسەلاتیکی پیرۆز وخاك وهەریمەکەی پیرۆزەو بەمیلەتیشەوە مولکی شایە[862] ، هەندیَ سەرچاوەی ئەکادیمی دەڵێن بەو جۆرە دەسەلاتە ووتراوە (سیزاریزم- ceasrism)نەك سیۆکراتی ، ،بەلام لەهەردوو بارداسزای لادان وسەرپیچی لەو جۆرە حوکمانە زۆر توند بوەبریتی بوە لە یاخی بوون لە خودا ، لە پەیامەکانی (پۆلسی ژ:13) بۆ میلەتی رۆمان هاتوە دەسەلات تەنها بۆ خودایە هەرچی ڕووبەڕووی دەسەلات ببیتەوە لە خوایاخی بوە-دەقەکەی:(1لتخضع كل نفس للسلاطين الفائقة، لانه ليس سلطان الا من الله، والسلاطين الكائنة هي مرتبة من الله، 2حتى ان من يقاوم السلطان يقاوم ترتيب الله، والمقاومون سياخذون لانفسهم دينونة 3 .فان الحكام ليسوا خوفا للاعمال الصالحة بل للشريرة. افتريد ان لا تخاف السلطان؟ افعل الصلاح فيكون لك مدح منه، 4لانه خادم الله للصلاح! ولكن ان فعلت الشر فخف، لانه لا يحمل السيف عبثا، اذ هو خادم الله، منتقم للغضب من الذي يفعل الشر 5 .لذلك يلزم ان يخضع له، ليس بسبب الغضب فقط، بل ايضا بسبب الضمير 6 . فانكم لاجل هذا توفون الجزية ايضا، اذ هم خدام الله مواظبون على ذلك بعينه 7 .فاعطوا الجميع حقوقهم :الجزية لمن له الجزية. الجباية لمن له الجباية. والخوف لمن له الخوف. والاكرام لمن له الاكرام) [863] ، **دوای** ئەوانەش زۆربەی جار پاپا فەرمانی وای داوە کە یاخی بوون لە دەسەلات یاخی بوونە لە

[862] Devine Right Theory –Haq,1969,p63

[863] كتاب المقدس– رسالة بولس الرسول الى اهل رومية اصحاح 13 .

مسیح[864] ، به هۆی نەپەرستنی خوای رۆمان وخودی قەیسەری رۆمان بەهەزاران مسیحی سوتینران ولەخاچدران به پاساوی ئیلحادی ئۆتۆکراسی.

**بناغەی فلسفی وفقهی سیۆکراتی** : ئەو بۆچوونه جگه له فقه بناغەی فلسفیشی هەبوو،له مەدرەسەی یۆنانی به دوو ئاڕسته بەرجەسته ببو ،بەرامبەر ئەو بۆچوونه مادیەکان بوون که پێیان وابوو نەك سیۆکراتی بەلکو ئاین له داهینانی بەشەریه، دوای ئاڕستەی سێیەم سەری هەلدا له نێوان هەردوولا ،ئەوەیان بناغەی دیزمیشه ، یەکەم جار ئەبیکۆر(342-270 پ.ز) له بارەی ململانێی نێوان فیلسوفانی بڕوادارو بێبڕوا وتی نه ئێوه ڕاستن نه ئەوانیش ،ڕاسته خوا دنیای دروست کردووه بەلام وازی لێهێناوه[865] ،لەوەوه تەیاری فلسفی دیزم -ربوبیەش-Deism)[866] هاتەکایەوه وعەلمانیەتی به دوای خۆی داهێنا، عەقلی زۆربەی سیاسەتمەدارو فەیلەسوفانی داگیرکرد هەتا هەندێ فەیلەسوفی ئاینیش ، لەوانه (مارتن لوتەر) دەلیت خودا بوونەوەری دروست کردو ڕێکی خست وبۆ ئادەمیزادی به جێهێشت[867]، لەسەردەمی نوێ (هربرت تچیرپۆری 1583-1648)بەیەکەم دامەزرێنەرەوەی دیزمی هەژمار دەکرێ[868]، هەرچی ( موسوعه لالاند)ه دەلێ یەکەم جار دیزم له کتێبێکی ڤیرپه به ناوی ( instraction chritiemt ) لەسالی 1564 هاتوه ،وەك بەدیلی سیۆکراتی، دیکارتیش یەکەم کەسه که یاساکانی سروشتی ئاوا داڕشت ودەلێ:خوا سروشتی دروست کردوه ووازی لیهیناوه،سروشت وژیان بێ خودا کاری خۆی بەهۆی یاساسروشتیەکان دەکا، بۆیه له تویژینەوەی (خواوەند) تەنها بۆ یەکەم پرۆسەی (خلق) پیویستە[869]، وەك وەسفی (ویل دیورانت) خودا به

---

[864] توماس هوبز–اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص652

[865] - موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص22 .

[866] له (موسوعه الفلسفيه ص227)ی سۆڤیەتی دەلێت: هربرت شیربۆری(1583-1648)باوکی ربوبیەیه واته ئەو دایهێناوه . که وشەیەکی لاتینیه به مانای (خودا) دوای بووه ئایدیۆلۆژیەکی ئاینی فەلسەفی که دان بەوه دەنێن خوا هەیه، بەلام دەلێن ئیش و کاری گەردوون و سروشت ناکا،

**[867]** شبلي عيسمى – علمانية ودولة الدينية.. - ص22

[868] موسوعة الفلسفية السوفيتية ص227

[869] الفيزياء ووجود الخالق ص25

سیستەمی(مەلەکی دەستووری)  شای بەریتانی چواندوە چۆن خاوەنە نەك حاكم ئەویش هەر دروست كەرە نەك فەرماندەر،ئەوەیان لە مێشكی میژووی زانست وفلسفە زیاتر گیر بوەو  زانایان (لوك، لیبنتز، رۆسۆ، لینج، ..) زۆری تر لە لایەك باوەڕیان بە خودا هەبووە بە عەلمانیەتیش وەك پێناسەی (جۆن هلێوك)ە، بەو میژوە بە هیزەیان لەلایەك ولاوازی ئەزمونی سیۆكراتی لە میژوو وای كردوە لەو سەردەمە سیۆكراتی ناشرین بێتە پیش چاو ،هەتا ئاینیەكانیش بە خیرایی ڕەتی دەكەنەوە دەلێن ئێمە سیۆكراتی نین ودەشلێن ئاینی ئیسلام سیۆكراتی نیە، كەچی لای بەرامبەری عەلمانیەوڕەتی ناكاتەوە ،لەو سەردەمە عەلمانی دەلیٚ حوكمی پەتی بەشەری ،سیۆكراتیش دەلیٚ حوكمی خوایی پەتی،لە كاتیكا (انی جاعل فی الارض خلیفة) ماناى وایە نە عەلمانی ونەسیۆكراتی بەلكو هەردوولا بە ستاندەری خۆی، واتە حوكمیك بە یاساكانی دادگەری بەلام بە چاودیری خەلك .

سیۆكراتی دەلیٚ (ان الحكم الا لله)ئەوەیان لە هەمو ئاینەكانە ،  خەلیفە سیبەری خودایە لەسەر زەوی ، ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەكاو دەلیٚ(أن السلطان ظل الله في الأرض)[870] زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەكان ووتراوە 60 سال لە سولتانیكی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بیٚ سولتان بین ، تەنانەت لە ناوەخۆشمان گوێمان لیبوە كە دەلێن حكومەت خوای سەرزەویە ،یاساكانی حمورابی وا هەژمار دەكرا كە لە ئاسمان هاتۆتە خوارەوە[871]،ئەو كاتە ملكەچی بۆی دەبوە بەشیٚ لە كرۆكی ئاین ، ،بەو سەردەمە ووتراوە سەردەمی نەفامی وتاریكی .

ئەوجۆرە حوكمە لەسەدەكانی ناوەراست لە ئەوروپا باوی  هەبوو، بەشیك بوو لە پاساوەكانی دەسەلاتی ڕەها وەك لە (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية) دەلیٚ: دەسەلاتی رەها لە سەدەی 16 سەری هەلداو لەسەدەی 17 بەرجەستە بووو لەدژی دەرەبەگایەتی تا گەیشتە رادەی ئەوەی دەسەلاتی رەها پاساوی خوای هینایەوە ووتیان مولك بۆ دەرەبەگ نیە بەلكو هەموی بۆ خوایەو  ووتیان شاو مەلیك تەنها بەرپرسن بەرامبەر خودا نەك میلەت یان خیلە دەرەبەگیەكان ... وئەو حوكمانە بە بناغەی سیۆكراتی وەسف كران  و لویسی شازدە ووتی دەولەت منم ومنیش

---

[870] مجموع الفتاوى ج291-290/28 .

[871]الموسوعة العربية العالمية – مادة: ثيوكرات .

دەولەت[872] ، بەمانای سەرتاسەری ،شمولی، ساتۆكراسی ،،ئۆتۆكراسی ،سیزاریۆم..، پیویستی بەپاساوو بەكارهینانی ئاینیش بوە ، لە ئەوروپاش مسیحی باوی هەبوو بواری دەستكاری وتەئویلی زۆر بوو ، بۆیە دەتوانین بڵێین سیۆكراتی ئەو كات سیستەمی حوكمی ئاینی مەسیحیە، لەو سەردەمی هاوپەیمانیەك بەناوی (حلف المقدس) كە لەنیوان روسیاو نەمساو پروسیا وا پیشاندرا ئەوان لەنیومەسیحیەت هەلبژیردراون لە لایەن خوداحوكم بكەن دوای زۆربەی سەركردەكانی ئەوروپا هاتنە ژێر ئەو هاوپەیمانیە دریژەی كیشا تانزیك جەنگی جیهانی یەكەم، لەو ئەزمونەش وەك سیۆكراتی تیایدا سەرۆك تەنیا بەرامبەر خوای بەرپرسیارە لە حوكم نەك بەرامبەر میللەت, بە پیێ ی ئەوسیستەمە ڕەخنە و لادانی سەرۆك و گوێڕایەڵ نەكردنی گوناحێك بوو سزای لەسەردنیادەدرا،نیشانەی بنچینەیی ئەو سیستەمە ئەوە بوو...1-شكۆمەندی سەرۆك,پێشە وا,ڕابەر ،ئیمپڕاتۆر ,2-یاخی بوون یاخی لەخوا بوون بوو ...3-بەمیرات جێكردنەوەی دەسەڵات ...بەو شێوەیە دەبینین ئەوسیستەمە هەم لەگەڵ ئیمراتۆریەتیش جیایەو هەم لەگەڵ سیستەمەكانی سەردمیش جیایە[873]، لەگەل سیستەمی كاریزمیش جیایە، بە پێی ئەو نیشانانە ئەوا ئێستاش دەسەڵات هەیە ماهیەتەكەی سیۆكراتیە,مادام جۆرە شكۆمەندی ومەزنایەتیەك بدرێتە سەرۆك وئیتر سیستەمی بنەما لەشی پێوە دیاربێت،هۆبز لە كتیبەكەی (الدولە-حقوق الملوك)ئەو وەسفەی پیكهینانی دەولەت لە كەسیك و..وەك تەفویزە سیۆكراتیەكەیە بەلام لێرە تەفویزی میلەتی وەرگرتوە ،ئەو دەلیێ با هەمو گەل متمانەی ڕەهای بداتە یەك كەس و بەلێنی گوێڕایەلی پێبدا و ئەویش لەلایەن ئەو خەلكەوە دەسەلاتی پێدەدریێ نەك یاساو دەستورو پەرلەمان ،ئەوكاتە سەرۆك یەكسان دەبێت بە هێزو ئەویش یەكسان دەبێت بەهێز، بەهەمان شێوە (مۆسۆلینی)دەلێت من وا لەمیكافیلی گەیشتوم كە (ئەمیر بریتیە لەدەولەت)[874]..ئیتر ئەوەش جۆرێكە لە سیۆكراتی مەدەنی ، یان رەنگە ناوی لیێبنری سیۆكراتی عەلمانی،خۆلە شیوعیەتیش بەزەق تر ئەو تەفویزەی لەلایەن مێژوو پێدەدرێت ، پەیامی پرۆلیتاریا لەدواوەی وپەیامی شیوعیەتیش لە پیشیەوە وادەكا سەرۆك لەلایەن میلەت

---

[872] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ص164 .

[873] الموسوعه السياسيه ص 257

[874] لە پیشەكی كتیبی نیقولا میكافیلی -(الامیر )—ص9

ومیژوو و گەشەسەندنەوە تەفویزی حوکمی پێدرابێت ،ئەوەش سیۆکراتی شیوعیەتە ،بۆیە هەرچی بە حوکمی ئەوانە ڕازی نەبوونایە سزای زۆر توند بوو ، لەئەزمونی سۆشیالیستی و حوکمە عەلمانیەکانی ڕۆژهەلاَت زیاتر بوە ، قایل نەبوون بە سەرۆك وەك ساخرۆف نەفی دەکرا،سزادەدرا، لەو دواییەش میراتی دەسەلات وبنەمالەییشی هاتە سەر، نمونەی کۆریای سەروو,کۆنگۆی دیموکراسی , لەکۆریاپیرۆزیەکی بێ ڕادەدار (کیم ئیل سونگ) سکرتێری حزبی شوعی ،لەدوای خۆشی بە وەسیەت کوڕەکەی دوای کوڕی کوڕی و ئەو پایەی وەرگرتو تائیستاش هەر میراتیە. لە سوشیالستیشا نموونەی پەیدابووە, سوریە, (ئەندێرا غاندی), دوای (راجیف غاندی), (وەلید جمبلاَت),(بنازیر بۆتۆ),(کۆرەزان ئەکینۆ...هتد

لەبنەچەداسیستەمی سیۆکراتی لەئیسلامدابەگشتیەکەی جێگەی نیە،جگەلە سەردەمی پیغمبەرەکان کە راستەوخۆ پەیامیان لە خواوە وەرگرتوە،لەو ڕووەوە ( موسا بن میمون) ڕای وانیە و دەلێ پیش ئەوەی خوا پیغمبەریك هەلبژیری خۆی ئەو قابیلیەتەی هەبوە واتە پیغمبەرایەتیش بەدەست مرۆڤ خۆیتی دەتوانی وابکا خۆی بگەیەنیتە ئەو ئاستە، لەو سۆنگەوە (معهد السلام الامریکی)لە پیناسی ئیسلامدا خراپ بەهەلەداچوە(کاتی دەلێت محمد دامەزرێنەری ئیسلامە)[875]ئەو ڕایە زیاتر بەلای دیزمیە(ربوبیە) کە تیایدا کەمتر خواوەند دەست لەکاروباری بوونەوەر وەدەدا، فارابیش تا ڕادەیەك وەها ڕایەکی هەیە لەکتیبەکەی (فی السیاسە المدنیە)[876] لەو سەردەمەش بەشێك ئەو ڕایەیان هەیە لەوانە (زانای ئیرانی عبدالکریم سروش) تێکڕا پێیان وایە لەوانیش سیۆکراتی نیە بەلکو عەقلی بەشەریە ،سپینوزاو دیکارت هەریەکە بە جۆرێك ڕایەکی وایان هەیەو دەلێن پیویست بە پەیامی دەرەکی(لای خودا)ناکا ئێمە پەیامی ناوەکیمان هەیە (کەفکرە)هەمان ڕۆل دەبینی ،ئەرکی فلسفە دۆزینەوەی[877]، بەلام( هۆبز)دەگەڕێتەوەو بەجۆریکی تر وەسفی پیغمبەر موسا بە فراوان تر دەکات ودەلیت خۆی وکاهینەکانی نوینەرایەتی خوا دەکەن[878] واتە سیۆکراتین،بەکورتی ئێمەش لەو

---

[875] معهد السلام الامریکی (حل النزاعات بین الادیان) –مرکز التعلیم والتدریب-2008 ص 81 .

[876] معجم المؤلفات السیاسیة ص19

[877] سبینوزا –رسالة فی الاهوت والسیاسة ص337 وص363

[878] توماس هوبز- اللفیاثان الاصول الطبیعةوالسیاسة لسلطة الدولة ص479

مەوسوعە ڕامان وایە پیغمبەرەکان سیۆکراتی بووینە وپەیامیان لەخوا وەرگرتوە ،باقیەکەی تر ئەزمونی بەشەریە، مادام (ولایەت)بۆ شوراو بۆ (ئوممەت)بێت مەگەر وەك (لادان لە ئیسلام) ئەگینا دانانی ئیمام و خەلیفە کارێکی ئیلاهی وپەیامی نیە بەڕای خەڵکی (ئوممەت) دێت، (عقدێکی سیاسی و کۆمەلآیەتی دنیایە)بۆیە خلافەتی ئیسلامی لەدوای (راشدین) نەبەئیمپراتۆریەت حیسابە نە بە سیوکراتیش ،هەرچەندە جووتیش نیە لەگەڵ حوکمی ئیسلامی ،یان وەك (ئەبوو ئەعلای مەودودی-لەکتیبی نظرية الاسلام السياسية)دەلێت دەسلاتی ئیسلامی بریتیە لە ئاویتەی دیموکراسی و سیۆکراتی (ثيؤديمقراطية)، بەلام هەروەك ئاینەکانی تر فقهی هاندانی دەسەلاتی سیۆکراتی تەنزیرکراوە ،نەك لە پێناو ئاین بەلکو لە پێناو سەرۆك وپاشاو ئیمپراتۆر ،بۆیەش کۆمەلێك نازناوی شازادەییان لێنراوە ،لەوانە: (أسد الدولة، الاشراف، الاعز، الاغا، الافضل، أفندي، أقبال الدولة، امين الدولة، تاج الملوك، الخواجة، شاهنشاه، صاحب الجلالة، الغازى، القائم بحق الله، القاهر، المستنصر بالله، المظفر، ملك الاشراف، ملك العادل، المهدي بالله، الناصر..)، لةكؤتايدا نازناوی سولتان زیاتر ختەملی ، لەسەردەمی ئەمەوی ئەو ناوە کەوتە پایەی سیاسی ،بە دام ودەزگای حکومی و قازیان دەووت سولتان، هەندی جار بە خلیفە دەووترا (اميرالمؤمنون) بە کەسی دوەمی دوای خەلیفە دەووترا سولتان ، لەسەردەمی عەباسی گەشەی کرد وبە خەلیفە دەووترا سولتان، یەکەم جارئەبوجەعفەری مەنسور(136-158ك) ناوی لەخۆنا سولتان لەووتاریکا ووتی: ئەی خەلکینە من سولتانی خوام لەسەر زەوی[879] .

لەو ڕوەوە مەزهەبی شیعە لە سیۆکراتی نزیك ترە، پێیان وایە خواو پیغمبەرو دوازدە ئیمامی ترو چاوەڕێی ئیمام مهدیشن ..هەمو ئەوانە بە پەیام ومەولەتی خوایی کاریان کردوە، بۆیە مەودای کاری بەشەری وعەقلی تەسك تر دەبێتەوە ،هەرچی مەزهەبی سونەیە تەنها پێی وایە پیغمبەران لە ژێر پەیامن، کە وادەکا ئیعتماد لەسەر خۆت بکەیت و (بنەمای جینشینی)پەیڕەو بکەی ،جگە لەهەندێ تەریقەومەزهەبی نزیك لەسونە کە پێیان وایە کەراماتیش هەیە شان بەشانی پەیام ،بەنمونە(**كتاب المواقف**) هی نفیریە دەلێ ئەو بۆچوونانەم لە خواوە پیگەیشتوە بەشەو پیم دەلێن : وقال لی امضی

[879] د عليان جارودى- التحولات الفكريه فى العالم الاسلامى ص550-

لامری اذا امرتك ولاتسألنی عن علمه كذلك اهل حضری من الملائكة العزائم لما امروا به ولایعقبون ،فأمضی ولاتعقب تكن منی وانا منك[880] ، ئەگینا مەودای عەقل وكاری بەشەری لە سونە فراوان ترە ،كەچی لە مەیدانی عەمەلی پیچەوانە دەبینین ، سونەكان لە فقها دواكەوتووترن وكەمتر داهێنانی عەقلیان هەیە،تەنانەت گەلێ جار عەقلی مرۆڤ تومەتبارە ،چونكە تا مەودای كاری مرۆڤی ئازادی زیاتر تێدا بێت زیاتر گەشە دەبینی .

وەسفی دەولەت ودەسەلات وحكومەت بە خوای سەرزەوی كراوە ،یان سێبەری خودا ، گوایە مادام كاری خەلكی ڕادەپەڕێنن ، تەنانەت لەسەدەی19 هیشتاپاپالیۆی سێزدەم دەیووت مادام كەسان هەن كاری گشتی ولەپیناوبەرژەوەندی گشتی كاردەكەن(وەك حكومەت) ئەوە لەجیاتی خوادەیكەن بۆیە ملكەچی وپابەندی فەرزە وەك فەرزی ئاینی[881] ، لە ناو مسیحیەت عەقیدەیەك بلاو بوویە دەلی كنیسە مالی خوایە (مەملەكەتی خوایە)[882] ، ئەكلیركی لە بنەچەدا لە (clerge) هاتوە مانای میرات واتە میراتگری خوایی، ،لەسەردەمی موساش ئەوان میراتگری خوا بوون كەواتە پیاوانی ئاینی میراتگری خوایین لەسەر ئەو زەویە كە مولكی خوایەو ئیتر باج وسەرانە بۆ ئەوانە ، هەندیك پۆلینی وورد دەلێ مەزهەبی كاتۆلیك زیاتر پابەند بوو بە سیۆكراتیانەی دەسەلات تا ئەو دواییەش،نمونەش بە نامەیەكی پاپای بەنواپازدەم دەهیننەوە بۆ كاردینال(مەندیس-پاتریاركی لشبۆنە)لە 18/كانونی یەكەم/1919 بەناوی كنیسە داوای كردوە كە باوەڕداران دەبێ هەردەم ملكەچ وگویڕایەلی دەسەلات بن-هەرچی دەسەلاتیكی لاتان[883] ،ئەو ڕێنماییە زۆر نزیكە لە رینمایە سەلەفی ئیسلامی (ئەوانەی پێیان دەووترێ سەلەفی مەدخەلی)،لە بەشیك فقهی ئیسلامی زیاتر لەوە (الغالب)واتە كێ سەركەوت دیارە ئەو لەسەر هەقەو خوا پشتیوانی كردوە ، ،یان لەخەلكی تر جیایە ،شان بەشانی ئەو دۆخە ئاینپەروەرانی ڕاستەقینە ڕووبەڕووی بووینەوە ، ئەو تەنزیركردنە بۆ زەمینەی سیۆكراتی لەهەردوولای

---

[880] كتاب المواقف والمخاطبات –محمدبن اكل النفیری –الموقف رقم14 ص29 .

[881] **فلسفة الدولة** ص601دوای لەو ڕایانەی خۆی پشیمان بوویەوە .

[882] توماس هوبز-اللفیاثان الاصول الطبیعة والسیاسة لسلطة الدولة **ص**658

[883] فلسفه الدوله ص602

ئاینی وسیۆکراتی لێی بەرپرسن ، لە ڕووبەڕووبوونەوەش هەردوولا کردوویانە وەك لەبرگەی کۆتایی دەردەکەوێ.

## سیۆکراتی سروشتی

زۆر بە چڕی واباو بووەو ئیستاش کاریگەری ماوە کەدەلێن خوا کاری ئاسمان بەڕێوە دەباو بەشەریش سەرزەوی، ئەوە قوولایی ئاینی و فلسفی هەیە،ڕیشەی دەچیتە نیو زۆربەی ئاینەکان، بۆیەش ئاسمان لە زەوی جیاکراوەتەوە ، واهەژمارکراوەئاسمان نامادی وزەوی مادی، ئاسمان پیرۆزەو زەویش پیس،لە رسالەکانی ئیخوان سفا دەلیت: پیکهاتەی ئاسمان(فریشتەوئەستیرە ورۆژو مانگ) نزیك ترین وپاك ترین دروست کراوی خوان بۆیە پەرستراون[884] ،تا ئەو ڕادەیەغەنوسیە(ڕوحیەکان)یش پێیان وابوومادەوپیکهاتە زەمینیەکان پیسن ولەدروستکراوی خوانین بەلکو لەدروست کراوی شەیتانە[885]، لە تەوراتیش: 1-(وَأَتَى اللهُ إِلَى لاَبَانَ الأَرَامِيِّ فِي حُلْمِ اللَّيْلِ وَقَالَ لَهُ: «احْتَرِزْ مِنْ أَنْ تُكَلِّمَ يَعْقُوبَ بِخَيْرٍ أَوْ شَرّ) 2-(فَأَتَى اللهُ إِلَى بَلْعَامَ لَيْلاً وَقَالَ لَهُ: إِنْ أَتَى الرِّجَالُ لِيَدْعُوكَ فَقُمِ اذْهَبْ مَعَهُمْ، إِنَّمَا تَعْمَلُ الأَمْرَ الَّذِي أُكَلِّمُكَ بِهِ فَقَطْ )[886] ، لە کتیبی پیرۆزی ئینجیل وتەورات وزەبوور دەبینرێ (الله من السماء اشرف على بني البشر لينظر هل من فاهم طالب الله)[887]، هەمو ئەوانە وایان کردوە کە ناوی خوا دێت خەلکی تەماشای ئاسمان بکەن ، گوایە لەوێ حوکم دەکاو سەرزەویش بۆ پاشاو گاداو سیۆکرات لەوەوە دێت .

ڕاستیەکەی ئەوەیە خودا نەلەئاسمانە ونەلەزەوی و نەئەوە مانای هەیە ، ئەگەر لە ئاسمان بیت واتە لە بوونەوەر جێی بوویتەوەو بچووکترە ،لە ئینجیلی برنابا وورد تر وەلامی ئەو بۆچوونە هەلەیەی داوەتەوە

---

[884] رسائل اخوان الصفاء.. رقم:33 ص116.

[885] بۆلدیفیز-الإقتراب من اللة- بحث فی اصل الكون-ت:منیر شریف ص61

[886] سفر التكوين 31: 24 ،سفر العدد 22 : 20

[887] كتاب المقدس- مزمور 53: 2

(فقال حينئذ بطرس : يا معلم لابد ان تكون الجنة أكبر من الله لأن الله يري داخلها ، أجاب يسوع : صه يا بطرس لأنك تجدف علي غير هدي)[888] ،نەڕاستەوخۆش حوکم لەسەر سروشت و گەردوون دەکات ،نەلەسەر کۆمەلگەش،بەلکو لەگەڵ یەکەم لەڕێ ی یاسا سروشتیەکانە، لەدوەم لەڕێ ی پەیام و قورئاندا، هەردووکیان (یاسای سروشتی و قورئان) یەك سەرچاوەیان هەیە ، ڕای زۆرسەیرو پیچەوانە هەیە لەبارەی پەیوەندی خواو سروشت،یان چۆنیەتی بەرێوەبردنی سروشت لەلای خودا، بەشیك پێیان وایە خوا دروست کەرە بەلام پەیوەندی بە ڕووداوەکانی نێو ئەو بوونەوەرە نەماوە ، لەکۆنەوە ئەبیقور (242ــ270 پ.ز) دەڵێ ڕەنگە خوا هەبێ بەلام بێ کار دانیشتوەو لە خوای ناوەشێتەوە حوکم لەو بوونەوەرە بکا و خۆی بچوك بکاتەوە بۆ کاری سروشت وگەردوون تەنها ئەتۆمی لە پاڵێەك ڕێز کردوە ئیتر ئەو بوونەوەرە بە ڕێکەوت وا بەڕێوەدەچی[889]، دوایش(ئەبیکرات) و(دیزمیەکان) لە فەلسەفەی یۆنانی .. تادەگاتە عەلمانیەتی ئەو سەردەمە کە دەڵێن (خلق) بۆ خوا دەگەڕێتەوە بەلام(امر) بۆ ئیمەیە ، بەشی دوەم کە زیاتر ئاینیەکی دلسۆزو بێزانیارین پێیان وایە هەمو ئەو کارو ڕەوشەی گەردوون وسروشت لەلایەن خواوە هەلدەسوڕێ ڕاستەوخۆ،واتە زۆر سەرقالە، زیاتر لەوەش هەیە دەلێ سروشت خۆی بەشیکە لەخوا، نەستۆریەکان دەلێن سروشتیش وەك عیسا نیوەی خوایەونیوەی مرۆڤە[890]، بۆیەش دەبێ حوکمی دەولەتیش هەر لەلای خواوە بێت وبەشێکی تری سیۆکراتی لێرەوە سەرچاوە دەگرێ ،نکولیان لەوە کردوە لەنیوان خوداو دروست کراوەکانی هیچ هەبێ جگە لە خۆی،بۆیە هەر ڕوداوێك دەگێڕنەوە بۆ خودا، (ئیخوان سەفا) زانیویەتی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نیوان خوداو بونەوەر نیە بەو جۆرەیان گوزارش کردوەو ووتویانە نیوان خوداو بونەوەرفریشتەیە هەندی دەم مادیەو هەندی دەم نامادیە[891]،ئاینیەکان کەمتر دانیان بە یاسای سروشتی هینابوو، ئاخۆ ڕۆلی ئەو یاسایانە چیە،کەوتونە کێی دروستکراوی خوایی، یاسای سروشتی یەکێك لەو219 کوفرانە بوو کە لەلە لیستی ڕەشی کنیسە تۆمارکرابوو،لەفقهی ئیسلامیش کەمتر جێی بۆ کراوەتەوە ، بە پێی هەندێ توێژینەوە یەکەم جار فیساگۆرس باسی لەیاسای

---

[888] انجيل برنابا – فصل 78 ايه 11-12 .

[889] موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص22 ، المثالية الألمانية-شلنج- ص377

[890] نەستۆری گرۆپێکی مسیحین لایەنگری (نەستۆر)ن لە451ز مردوە دەیوت مسیح نیوەی مرۆڤەو نیوەکەی تری خودایە.

[891] رسائل اخوان الصفاء.. ص37

سروشتی کردوه..واتە ئەسلیکی ئاینی هەبوە،توماس ئەکوینی هەولی داوە لەوانە ئەکادیمیانە تربۆ(ئیرادەی خودا)بچێ ودەلێ یاسای سروشتی بریتیە لەئیرادەی خودا( القوانین العالم تعبیر لإرادە اللە )[892] ،ڕاستەوخۆ تر فەیلەسوف وشاعیری کورد مەلای گەورە دەلێ:علمی تەبیعەت علمی خودایە قالەوقەوالە گشتی هەبایە..،خودا لیرە بێ دەسەلات نیە وەك یەکەم جار یەهودیەکان ووتیان ئینجا فلسفەشی بەدواهات هەروەك لەقورئان ڕوونی کردۆتەوە(وقالت الیهود ید اللە مغلولە غلت ایدیهم..- سورە المائدە ایە64) ،لەو بونەوەرەمرۆڤ تیایدا(بدیل)ی خودا نیە بەلکو (جینشینی) خودایە،واتە دەولەت وپاشاو ئیمپراتۆرخوای سەرزەوی نین،تا سیۆکرات جێی ببتەوە ، یان بەدیویکی تر سروشت وبوونەوەر بە یاساکانی خودا بەڕێوە دەچی بیئەوەی مرۆڤ بتوانی هیچ دەستکاریەکی بکا واتە سروشت سیۆکراتیانە بەڕێوە دەچی، هەرچی مرۆڤە پەیوەندی بە خودا لەڕێی پەیامە ،جگە لە پیغمبەرەکان کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە خوا هەبوە ،ئەو دۆخانە پێی ووتراوە (موعجیزە) ،هەر بۆیەش حوکمی پێغمبەرەکان حوکمی سیۆکراتی بوە ، ئەوکاتانەش سیۆکراتی(نامادی) ودادگەری(مادی) جووت دەبن ، لەدوای ئەوان یەکسەر حوکمی سیۆکراتی تەواو دەبێ ،بەلام دادگەری دەمێنی[893] .

لە راستیدا (نەك سروشت)گەردوون هەموی بە هۆی سیستەمی سیۆکراتی بەریوە دەچیت بەلام لەبەر ئەوەی لە ژێر ئەو ناوە تاوانی گەورە کراوە ،فیلی گەورە لە خەلك کراوە ئەو زاراوە بوویتە ترس کەس ناویری بە چاکە باسی بکا ،بۆیە ئەهلی ئاینیش بە خیرایی لەخۆی ومیژوو وسروشت وپەیامەکان دوور دەخاتەوە ناتوانی وەك پیویست لە جێی خۆی دا یبنیت ،هەمو بوونەوەر (بە گەردوون وسروشتیشەوە) سیۆکراتیانە بەڕێوە دەچی ،تەنها میژووی مرۆڤ بەدەرە لەو یاسایە ،لەویش ئەوکاتانەی حوکمی پیغمبەرەکانە حوکمیکی سیۆکراتیە ،لەگەل پچڕانی پەیام حوکم دەبیتەوە بەشەری ومەدەنی ،هەر ناویکی لینراوە هەلخەلەتێنەر بوە .

بەکارهێنانی ئاین لەلایەن دەسەلاتدارانەوە (سیۆکراتی مادی)

---

[892] الفلسفة والفیزیاء ج1ص86 .

[893] بۆ زیاتر بروانە: رەوشی فلسفی لەسەدەی 21 – بەندە .

هەر ناوی سیۆکراتی دێت وەك توومەت ڕوو لە ئاین دەکرێ بەگشتی وبەتایبەتی(یەهودی-مسیحی-ئسلام)،کەچی هەندێ جارپیچەوانەیە ،واپێدەچی کۆن ترین شێوەی سیۆکراتی ئەو جۆرە بووبن ،وادەگۆترێ کۆن ترین شیوەی ئەو دەسەلاتە لەسەردەمی سۆمەریەکان بوە ،ئەوکاتی بۆهەرشارێك حکومەتیك هەبوو لەسەرووی ئەو حکومەتە پادشایەکی هەبوو بەناوی(ئاین) یان(ئانسی) یان(لۆکال)ئەوانە بەناوی خودا فەرمانیان داوە[894] ، بە پیچەوانەوە ئاینی ڕاستەقینە دژی ئەوانە وەستاوە ، زۆربەی جار ستەمکارو پادشاکان نەك هەر بەناوی خودا حوکمیان کردوە بەلکو ووتویانە خۆمان خواین ،ئەوەش شێوەیەکی توندی سیۆکراتی بوە زۆر کەم باس کراوە ، زۆربەی جار فەیلەسوف وزانای سیکۆلاری هانی پاشاو ئیمپراتۆریەتی داوە پاگندەی ئەو پۆستە بکاو وەسفی بە خودا یان هاوبەش لەگەل خودا بکا،بە تایبەتی لەکاتی سەرکەوتنە سەربازیەکان، ئەو زاناو فەیلەسوفانەی زۆر لاگیری دەسەلات بووینە پێیان ووتون(ستۆیلی) واتە: بەردەم پایە — ماستاوچی،یان جاریش وایە پێیان ووتراوە(لووکی)،لەوانە زینۆن(300 پ ز)بۆپاپای ئەسینا،مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس (60 -120) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو.. ،بە هەمان شیوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی..، میکاڤیلی بۆ بنەمالەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و...تەنانەت (لیپینتز)دەی ووت ئەمیرمان وینەیەکی خوایە لەسەر زەوی[895]،بۆیە ناکرێ تەنها ئەهلی ئاین تومەتبار بکرێ بە دروست کردنی سیۆکراتی ،جیاوازیەکانی ئەفلاتونی ئاینی وئەرستۆی لائیکی لە وینەکانی رۆفائیل بەڕوونی پیچەوانەی ئەو بۆچوونانە دەردەخا، لەو بارەیەوە لە کۆنەوە ووتراوە(هۆمیرۆس) ووتویەتی هەندی جار سەرکەوتنەکانی سەرۆك وادەکا ڕایەکی گشتی دروست بیت و بلێن خوای لەپشتە،لە زۆربەی ئاینەکان بیرۆکەکی تر هەبوو دەیان ووت مادام دەسەلات ودەولەتەکە دروست بوە هەر بە ئیرادەی خواییە ئەگینا دروست نەدەبوو ،کەواتە خواپێداوە لەسەر ئێمە تەنها ملکەچی وگویڕایەلیە، لە قۆناغی یەکەم پادشا پاگندەی ئەوەی کردوە کە خۆی خودایە (نەك مەولەتی خوای پێدرابیت) نمونەشیان لە رۆمەکان و فرعەونەکانی میسرەبە ڕوونی دەردەکەوێ(فقال انا

---

[894] العبید فی العراق القدیم ص12 .

[895] بۆ ئەو ووتەی لیپینتز بڕوانە: معجم المؤلفات السیاسیة ص236

ربکم الاعلی)[896] له هەندێ سەرچاوە دەڵێن( سەرجۆنی ئەکەدی)یش داوای خوایەتی کردوە[897]، جاریش وابوە ئەو حوکمانە وایان لەخەڵکی گەیاندوە کەسنورەکانی دەوڵەت وئیمپراتۆر لەلایەن جن وفریشتە دەپارێزرێ ،له سەردەمی بابلیەکان شیدۆ ئەو جن وگیانە عفریتیانە بووینە سنورو پاوانی بابلی وئاشوریەکانی پاراستوە ،ئەوانە نێوانی خواو مرۆڤ بووینە لەشیوەی مانگای باڵدار[898] . لەکۆنەوە جاروایە حوکمی سیۆکراتی دەگاتە سەرووی ئیلحادی ،وەك هۆمیرۆس دەڵێ بەپیرۆزکردنی سەرۆك گەیشتۆتە ڕادەی پەرستن ،وهەژمارکردنی وەك خودا ،تەنانەت ناوبراو دەڵێ بیرۆکەی خودا لەوە هاتوە .(د عدنان ابراهیم-مگرقه البرهان وزجاج الالحادص41) بەهەمان شیوە هەندی فرعون ونمرود قەیسەر وابووینە . واتە سیۆکراتی ئاینی هەبوە سیۆکراتی مولحیدیش هەبوە ئیستا سیۆکراتی عەلمانیش هەبوەو هەیە(چ فەرمانی خوا چ فەرمانی شا) وەك لەسەروو باسی جۆری سیۆکراتی (عەلمانی وشیوعی)مان کرد، جۆریکی تریشی سیۆکراتی مادی بەناوی (jure divinoe)مانای مافی خودایی - بەکارهێناوە[899]، له (موسوعە لالاند)پێی وایە بناغە فلسفیەکانی ئەو جۆرە حوکمە لە یاساکانی سروشت(فیزیۆکرات) وەردەگریت نەك خودا،هەرچی سیۆکراتیە پێی وایە حوکم لە خودا وەردەگیرێ[900] ، ئەو جۆرە حوکمە ناو زاراوەی خۆی هەیە پێی دەووترێ (سایزۆکراتی ) نزیکە لە (سیۆکراتی مادی) ، سیۆکراتی مادی هەمان سروشتی دەسەلاتە بەلام ئەو مەولەت له سروشت وەردەگرێ ، حزبە مارکسیەکان پیشڕەوایەتی گەشەی تەواوی کۆمەلگەیان دەکردو لەلایەن میژوەوە (تەفویزیان پێدرابوو )جۆریك بوو له سیۆکراتی مادی ،ئەگەر سیۆکراتی ئاینی تەفویزیان لای خودای خۆیان بوو ئەوە لای شیوعیش کە لەجیاتی خودا (مێژوو) ئەو رۆلەی دەبینی تەفویزی پیدا بوون که پیشڕەوایەتی کۆمەلگە بکەن ،بە هۆی نوینەرایەتی پرۆلیتاریا کە پەیامیکی( حەتمیەی میژوویی) هەلگرتوە ،بەخەلکی تر ناکرێ جگە لە حزبە شیوعیەکان .

---

[896] سوره النازعات(79)ئایەتی 24

[897] **بڕوانە** : تأريخ حضارة وادي الرافدين.. - د.احمد سوسەص201 .

[898] **قاموس الاساطير ..ص153**

[899] توماس هوبز-اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص657

[900] موسوعە لالاند ص257

بەشێکی تر حوکمڕانان پاپاو کاهن وئیمام و پیاوانی ئاینی نەبووینە بە جل وبەرگ وڕیش وفەرهەنگی ئاینی سیۆکراتی پەیڕەو بکەن بەلکو کەسانی لائیکی بووینە سیستەمی سیۆکراتیان بەرجەستە کردوە لە چوارچێوەی بەکارهێنانی ئاین بۆ دەسەلات ،لە ڕاستیدا بەکارهێنانی ئاین بۆ دەسەلات ئەوکاتە یە کە ئامانجت دادگەری نەبێت بەلکو ئامانجت خۆت بێت ، ئەو جۆرە دەسەلاتە لە قۆناغەکانی وەرچەرخەان لە ئەوروپا بەدی کرا،بۆ ئەوەی خۆی ودەولەت یەکسان بن ، لویسی چواردە(1661-1705) من دەولەتم ،لە جیهانیش لە سەدەی بیستەم زیاترئەو جۆرە سیستەمە هاتەکایەوە ، شای ئەسیۆبیا ناوی لەخۆنا (هیلاسیلاسی) مانای (سیکوچکە)ئاماژە بە عقیدەی مسیحی ، دوای ناویکی تریشی زیادکرد(الاسدالقاهر من سبط یهوذا المختار من اللة ملك اثیوبیا)[901] ، لە ئێران دروشم ئەوەبوو (چ فەرمانی شا چ فەرمانی خوا) ،ئەوە هەم سیۆکراتیە هەم ئۆتۆکراسیشە، مانای لەجیاتی خودا حوکم کردن دەدا کە سەرۆك پابەند نابیت بەدەستور پلەیەکی تریش جیایە لەگەل دیکتاتۆری، رۆمەکانیش کە نەیانتوانیە سیۆکراتی ئاینی بەرجەستە بکەن بەلای سیۆکراتی مادی داڕۆیشتون وسەربردەیەکیان هۆنیتەوە بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی خۆیان ، ووتویانە بنەمالەی حوکمڕانی ڕۆم تایبەتن وسەرجەلەیان بەشەر نیە ، لەسەربردەیەکی (رۆمۆلاس وریمۆس)هاتوە ،ئەوانە دووبرای جمك بووینە دایکیان مردوەو باوکیشیان رۆلی خوای جەنگی بینیوە بۆیە ئەو دوو برایە بە ڕووباری تایبیر دراون گورگێك هەلیگرتوونەوەو بەخێوی کردوون ،دوای شوانێك ئەوانەی دۆزیتەوەو گەورەی کردوون ،دوای ئەو دووبرایە لەچاکەی گورگەکە ویستیان شاریك دروست بکەن لەو شوینەی کە گورگەکە ئەوانەی لە رووبار دەرهێنا ،دووبراکە بوە شەڕیان ریمۆس کوژراو ریمۆلۆس تەواوی کردو خۆشی بوە حاکمی ئەو شارەو ئیتر حوکمی رۆم لەنەوەی رۆمۆلۆس لەو سەربردە غەیبیە لە سالانی 753 ق.م. دێت ، بەهەمان شێوە سەرگۆنی ئەکەدی گوایە بەعاشقی عەشتار لەدایك بوە ،بە رووباری فورات دراوەو عەشتار(خوای ئەو سەردەمی) عاشقی بوەو کردوویە بە پادشا [902].

---

[901] الموسوعة العربية ج22 ص63 .

[902] قاموس الخرافيات والاساطير.. ص154 .

<u>سروشتی ئەو جۆرە دەسەلاتە:</u> هەر دیاردەیەکی میژوویی بێبنچینە نیە ،سەربردەی خۆی هەیە ،بیناسنامەو ڕیشە نیە وەك لەسەروو باس کرا ،سروشتی سیۆکراتی لەو پیناسەی (قاموس الكتاب المقدس - دائره المعارف الكتابيه المسيحيه)بۆ ( كاهين )بەڕوونی دەردەکەوێ ،واهاتوە : (الكاهن هو الشخص المعين للقيام بالخدمات الدينية والعمل وسيطًا بين الناس والله), لە ئاینی شنتویەی ژاپۆنی پەیوەندی خوا لەگەل خەلکی لەڕیی ئیمپراتۆرەوە دەبیت کە پیی دەلین (میکادۆ)[903].واتە پیاوانی ئاینی ڕۆلی نێوان خوداو ئادەمیزاد دەبینی ، ووتەیەکی بەناوبانگی (پۆلس)یش واهاتوە: هیچ دەسەلاتیك ڕەوانیە تەنها ئەوەی لای خوداهاتوە[904] ،لەوەوە مارکس لە کتیبی (فی مسألة اليهودية) وەسفی ئەو جۆرە حوکمە بە ئاسمانی ونامۆدەکات، لە قۆناغی یەکەمی مەسیحیەتیش جێی دەبیتەوە ، دوو جۆرە دەسەلات هەبوو ،یەکیان خوایی ورووحی بۆ پاپاوقەشە دوەمیان دونیایی بۆ پاشاو ئیمپراتۆرەکان ، دەبوایە دوەمیان لە ژیر سایەی یەکەم بێت بیئەوەی یەکەم ڕۆلی دوەم ببینی ،هەندی جار ئیمپراتۆرەکان دەسەلاتی یەکەمیشیان لای خۆیان کۆدەکردەوەو سیۆکراتی لی دروست دەبوو، یان بە پیچەوانە،وەك یۆنانیەکان،ڕۆم،بابلیەکان،چینیەکان،هندیەکان،میسریەکان،مایا،...)،زۆربەیان بە شێوەیەك لە شێوەکان دەولەتێکی خواییان بۆ خۆ دروست کردوە تا دەسەلاتیان بە هێز بێت،وەك تەنزیرەك بۆ هاوتایی پاپاو ئیمپراتۆردەیانگوت: هەروەك مرۆڤ لەدوولای مادی وروحی پیك هاتوە دەبێ دەسەلاتیش لەو دوولایە پێك بێت، ئاین وپاپا بۆ روحی مرۆڤ ودەولەت وئیمپراتۆریش بۆ جەستەکەی،لە بەرامبەریش هەولدراوە ئەو ڕاڤەیە نەبێتە پاساوی دەسەلاتی ڕەهاو چینایەتی ،لەوەوە بیرۆکەی سیکولار هات بەتەواوی ئاین وسیاسەتیان لیك جیاکردەوە .

بەکورتی ئەو جۆرە دەسەلاتانە زۆر دژ بە ئازادی بوە ،مانا ئاینیەکەی ئەوەیە سیاسیانە ئاینی بەکارهیناوە تائەو ڕادەیەی پاگندەی پیغمبەرایەتی کردوە کە تەنها ئەوان پەیامیان بۆ هاتوە بەلام (تەفویزی خواییان نەبوە) بۆیە خۆیان لەوانیش ڕەتداوە،ئەوەی بە ئاشکرا ئەوەی ووتوە قوستەنتینی یەکەم بوە ووتویەتی پاشاو ئەمیر نوینەری خوانە لەسەرزەوی ،ئینجا ئەگەر بتوانین بلێین حوکمی

---

[903] محمد فريد وجدى-مژاهب فلسفيه ,دارالكتب هلال/بيروت ص213. هەروەها هەمان زانیاری لە (موسوعه الفلسفيه السوفيتيه)هاتوە .

[904] فلسفة الدولة ص599 .

پیغمبەرەکان سیۆکراتی بووبیت ئەوا بۆ هێنانە دی دادگەری بوە نەك پاراستنی دەسەلات، بۆیە سیۆکراتی بەشەری شیوەی هەرە دیکتاتۆری بوە لە میژوو ،تەنانەت لەگەل دیکتاتۆری وئۆتۆکراسیش جیایە(یانبەئەلمانیەکەی ئۆتارخی)[905]،قاموسی(Amodern Dictionary )جیاوازیەکی تری دەسەلاتی ڕەهاو دەسەلاتی دیکتاتۆری کردوە ،بەوەی دەسەلاتی ڕەها پابەند نابێ بە یاساو دەستور بە زەبری هیز هەرچی سیۆکراتیە بەزەبری هیزو هەلخەلەتاندن، دەلێ ڕێنماییم لەلایەن خواوە بۆ هاتوە [906]، لەو دووە دەسەلات بەزەبری هیز لەدەستی تاکە کەسیك بوە ،بەلام شەرعیەت بە بەرگری دەسەلاتی واهەبوە ، لە سیۆکراتی هەمان ناوەڕۆکەو بە هەلخەلاتدنەوە نەتوانرێ بەرگریشی بکریت ، خراتر لەوەش ئۆقرە گرتن بەرامبەر دەسەلاتی ئاواو دەسەلاتی زالم بە عیبادەت هەژمارکراوە ، یان هەلگرتنی ئەو تووڕەییە بۆ رۆژی دوای لە ئینجیل واهاتوە : (( سمعتم انه قيل: عين بعين وسن بسن، أما أنا فأقول لكم: لا تقاوموا من يسيئ إليكم . من لطمك عن خدك الأيمن فحول له الآخر، ومن أراد أن يخاصمك ليأخذ ثوبك، فاترك له رداءك أيضاً))[907]، لەوەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدين افيون الشعوب) لەلای مارکس هات، قەشە ئۆگستین دەیوت هەژاروبەندەقەدەری خودایە نابی خۆ رزگار بکەن وئەو قەدەرە تیك بدەن ، ابن عبد ربه هەمان بۆچوون بەناوی ئاینی ئیسلام دووبارە دەکاتەوەو دەلێ:اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر[908]، ( عبد الكريم الخطيب)یش رِاي ( الحسن البصرى)دەگیڕیتەوە ودەلێ: ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة) ،ئيبن تةيمية بة جؤريكى تر دةلىَ: أن السلطان ظل الله في الأرض، ويقال: ستون سنة من إمام جائر أصلح من ليلة واحدة بلا سلطان، والتجربة تبين ذلك...

---

[905] بە ئەلمانی لە جیاتی دەسەلاتی ڕەهاو (ئۆتۆکراتی)دەووتری (ئۆتارخی) ئەگەر بوەئۆتارکی وەردەچەرخیتە مانای ئابووری (اكتفا الذاتى)–برِوانة: القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3ص154 .

[906] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts p19-(المعجم الحديپ للتحليل السياسى)

[907] - متى 5 (39 – 41) الكتاب المقدس العهد الجديد-

[908]د محمد شحرور–الكتاب والقران ص101

فالواجب اتخاذ الإمارة ديناً وقربة يتقرب بها إلى الله ، فإن التقرب إليه فيها بطاعته وطاعة رسوله من أفضل القربات، وإنما يفسد فيها حال أكثر الناس لابتغاء الرياسة أو المال)[909]، دەسەلات وایە هەمو کەس چاوی لێیە ، هەردوو تەوەری ئاینی وسیاسی گوریسکیشکەیان لەسەر کردوە ،جاریش وایە ریك کەوتون هەردوولا بەشدار بن ، لەوەوە لە نیو مسیحیەت وەك نیوبژی هەردوو دەسەلاتی دنیایی و دوارۆژیان بۆ ئەو جۆرە دەسەلاتە کۆکردۆتەوە ،دەلین دەولەت لەسەر دوو پیچکە دەڕوا ،یەکیان سیستەمی کنیسەی جیهان وئەوی تریش سیستەمی ئیمپراتۆریەتی جیهانی هەردوکیشی لە کەسیتی (مسیح)کۆدەبیتەوە وەك پادشاو راهب،هەندی جار کنیسە هەولی زیاتری دەدابۆ زال بوون دەسەلات دەرهینان لەوانە پاپا گریگۆری حەفتەم دەیووت دەولەت کاری شەیتانە پیویستی بە پاکردنەوەی هەیە بەهۆی کنیسەو دەیویست بەتەنها حوکم بکا ، (کانت) دەڵێ (ئەزمونەکان دەیسەلمێنن کە هەرچی دەسەڵاتی هەبووبێ خراپەی کردووە.. هەموو لەگەڵ هەموو..هەریەکەش لەگەڵ هەموو لە جەنگی بەردەوامدان)[910]..مارکسیەت هەربیرۆکەی دەولەتی رەتکردەوە...،هەندێ جاری تریش ئیمپراتۆرەکان کنیسەیان دووردەخستەوە ،لە هەرسێ باردا دیکتاتۆری لیدەردەچوو ،بەلام دیکتاتۆریەتی یەکلا یەنیەکە تۆختر بوە پێی ووتراوە (مۆنۆکراسی) ، قەشە پۆسویا دەیوت چۆن هەمو کاریکی گەردوونی بۆخوایە ئاواش هەمو کاریکی دەولەت بۆ شایە ،لەوەوە لویسی شازدەم دەیووت من دەولەتم ودەولەتیش منم ، زولمی بەشەری بەبێبەرگری لەو سنورەش ناوەستێ ، جاروایە ئارەزووی خۆی یان راویژکاری زولمی نوێی بۆ دادەهینن ، بواریك بۆ ئازادی ومەدەنی ناهیلیتەوە لەهەندێ قاموس بۆ ئەو جۆرە دەسەلاتە زاراوەی (ساتۆکراسی)بەکارهیناوە کەقۆناغی پیشی سیۆکراتیە، بە مانای هەمو چالاکیەك بۆ دەولەت [911] .

---

[909] مجموع الفتاوى ج28/290–291

[910] فلسفه القانون والسياسه- عمانوئيل كانت -(تا ڕاددەيەك ئەو ڕايە لەگەل دەقى ئاينيش دێتەوە هەروەك لـە قورئـانيش دەلى (كلاأن الانسان ليطغى إن رأى إستغنى ) .

[911] لەنمونەی سەردەم ووتارەکەی مۆسۆلینی لە28ئۆکتۆبەر1926 میلانۆ ووتـی نـابی هـیچ چـالاکیەك دژ بەدەولـەت قـەبوول نیـە ،ئـەوەش یەکیکـە لـە تایبەتمەندیـەکانی فاشـیەتی مۆسـۆلینی .بڕوانـە:قـاموس المصـطلحات السياسـية والدستورية والدولية –د احمد سعيفان ص201

لەگەل سیستەمی سیۆکراتی هەندێ جار مال ومولك وناموسیشیان کەوتۆتە ژێر رەحمەتی دەسەلات وەك بەشیك لە ئەرکی ئاینی،لەباریکی کۆمەڵایەتی و جنسی وابوو کەس خاوەنی خاوخێزانی خۆی نەبوو، لەوەوە مافی شەوی یەکەمی بووکێنی سەری هەلدا ، سیستەمی سیۆکراتی هەر دەسەلاتی پەتی نەبوو بەلکو فەقیهی ئاینیان هەبوو بۆ هەر کارێکیان بنچینەیەکی ئاینی بۆ دەدۆزیەوە ،بۆیە زۆربەی دەقی ئاینەکان تووشی دەستکاری دەهاتن ، رۆبیرت فیلمەر یەکیك بوو لە دەمڕاستی بەناوبانگی ریبازی سیۆکراسی ،دەیووت: دەولەت وەك خانەوادەیەو پاشاش وەك باوکە ،پشتی بە تەورات دەبەست و دەیووت ئادەم یەکەم پادشا بوە لەسەر زەوی،چارلزی یەکەمیش بۆ بریتانیا میراتگری راستەقینەی ئادەمە ،بۆیە هەر پیچەوانەیەك لەگەلی پیچەوانەی خواو ئادەمە ، بەو جۆرە هەریەکە لە (جیمسی یەکەم) و چارلزی کوڕی لە بریتانیا شەرعیەتی دەسەلاتیان لەو تیگەیشتنی جۆری سیۆکراتی لە حوکم وەرگرت ،بۆیەش کە چارلز کوژرا ناوی بە شەهیدی دەسەلات تۆمارکرا.

لەسەر ئەو بنچینە زۆر شێوەی وەرگرتوە ناچار هەندێ قاوغی پیویستە بۆ دەست نیشان کردنی و سروشتی ئەو جۆرە حوکمە ، لە (الموسوعە المیسرە ) دەلی سیۆکراتی ئەوەیە مادام دەسەلاتی دنیای بەدوای دەسەلاتی روحی بوو ئەوە سیۆکراتیە[912] ، نزیك لەوە (موسوعەالمعرفە)ش دەلێ مادام پیاوانی ئاینی یان زانایانی ئاینی دەسەلاتدار بن وشەریعەتی ئاین پیادە بکەن ئەوە سیۆکراتیە[913] ، پاوەنکردنی دەسەلاتەکەش لەوە دێت کە پیاوانی ئاینی دەلین ئیمە شارەزای شریعەتی خواین بۆیە هەر دەبی ئەو دەسەلاتە لە دەست ئێمە بیت ،بەو پێیە ئەو مەوسوعەیە ومیژووی خەلافەتەکان بە سیۆکراسی هەژمار دەکریت ،ئیرانی ئیستاوهەندیکی تر لەوانە( modern Dictionary Political Analiysis) دەلێ حکومەتی عبری وکالفنی لە جنیف و تبت وئیرانی سەردەمی شاشی دەگرتەوە[914] ..هەندیکی ترئیسرائیل و سعودیەو وپیۆریتانی مسیحی.. ،مەوسوعەی بریتانی( Encyclopædia

---

[912] الموسوعه المیسرەللمصگلحات السیاسیه ص142ص249 و ..

[913] موسوعة المعرفة –مادة: حق الالهی للملوك

[914] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts - p453

Britannica) هەریەکەلە (سعودیەو ئیران وڤاتیکان)بە سیۆکراتی هەژمار دەکات: . Contemporary examples of theocracies include Saudi Arabia, Iran, and the Vatican[915]،لەسەر ئەو بنچینەیە هەندیك پێیان وایە هەریەکە لە ئیران وڤاتیکان وئیسرائیل و بۆتان وئەندۆرا(قەشە ئۆرجیل) تیبت(دلایی لاما) وجاریش وایە سعودیەش وا پۆلین دەکەن ، ئەوەی ڤاتیکان لەوەتەی 1929 دروست بوە سەرۆك(پاپا) هەتا مردنە و ڕەنگە نزیك بێت لە سیۆکراسی بەلام باقیەکەی تر ئاوا نیە، هەرخودی زاراوەی ئەکلیرکی لە بنەچەدا لە (clerge) هاتوە مانای میرات واتە میراتگری خوایی، ،لەسەردەمی موساش ئەوان میراتگری خوا بوون لەسەر ئەو زەویە کە مولکی خوایەو ئیتر باج وسەرانە بۆ ئەوانە[916]،هەرلەسەر ئەو بنچینەیە کنیسە مالی خوایە (مەملەکەتی خوایە) بەوەوە مانای وایە دەولەتی ڤاتیکانی ئیستا بە سیۆکراتی هەژماردەکرێ ،ئیسرائیل هەلبژاردنی دیموکراسیانەی لێدەکرێ کەچی لە (موسوعە السیاسە- دکیالی) دەلێ تاکە دەولەتی سیۆکراتیە لەجیهان[917] لەکاتیکا بەشیك پێیان وایە تاکە وولاتی دیموکراسی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە تەنها ئەوەیە یاساکانی ئیسرائیل لە (هالاخات) وەرگیراوە کە یاسای یەهودین ، ئیرانیش هەلبژاردنی دیموکراسی لیدەکرێ تا ئیستا 8 سەرۆك کۆمار گۆڕاوە ،ئەوەی سعودیە مەلیك هەتا هەتایە بەلام ئەویش سیۆکراسی نیە زیاتر لەوەش بینای دەسەلات لەسەر لیك جیاکردنەوەی فتواو حوکم هاتوە کە لە عەلمانی نزیك ترە ، تەنانەت کالڤینیەکان (کەناویان لەسەروو هاتوە) سیبۆکراتی نیین مادام حوکمی زۆرداری ڕەت دەکەنەوەو خۆشیان ناکەنە خاوەنی میراتی خوایی ،بەلکو دەلێن جیبەجێ کردنی حوکمی خودا بە پێی پەیام .

سەبارەت بەبزوتنەوەی ئیسلامیەکان و لە ولاّتە ئیسلامیە کانیش سیۆکراتی نین، لە چیچان سەرۆکەکەی(جوهردۆداسیڤ) شەهید بوو کوڕی نەهاتە شوێنی,(سلیم خان) هات، لەئێران لەدوای(ا-خمینی) (ا.علی خامنائی) هاتەشوێنی هەرلەنەتەوەی ئەویش نەبوو، خەریکە بلێین هەندێ جار عەلمانیەتی توندی جیهانی ئیسلامی لە نیشانەکانی سیۆکراتی نزیکە ، بە تایبەتی پاساوی مانەوەی

---

915 Encyclopædia Britannica –Article: Theocratic

916 توماس هوبز-اللفیاثان الاصول الطبیعة والسیاسة لسلطة الدولة ص517 .

917 عبدالوهاب الکیالی -الموسوعە السیاسیە ج1ص928

،لەکاتیکا لە خودی ئاینی ئیسلام بەو شێوەیە نیە ، حوکمی ئاینی لێرە مانای سیۆکراتی ناگریتەوە هەتا لەبارە هەرە تۆخەکانیش ،ئەوەتا فەرمودەی گویڕایەلی دەسەلاتدار(على المرء السمع والطاعة فيما أحب أو كره ما لم يؤمر بمعصية، فإن أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة) مەرجدارە ،بەرِەهایی نیە ،لەوەوە پیناسی ئیبن خەلدوون بۆ (خلافە) دوو رِەهەندیە ئاینی وسیاسی (دنیایی ودوارِۆژی).

کاریزمی وسیۆکراتی: ئەو دوو چەمکە زۆر لێك نزیکن زۆربەی جار تیکەل دەبن ئەگەر چی هەندێ جیاوازیشیان هەیە ، جاریش وایە (اباء المؤسسين)یشیان پێدەووترێ، یان (حرس القديم) هەندێ جار(گرینۆتۆکراسی)،بەلام هەر لە زەمینەی تویژینەوەی سیۆکراتی چەمکی کاریزما سەری هەلدا لەلایەن (ئەرنست ترۆلتش) ئینجا (ماکس ڤیبەر) ،بە مانای ئەگریکی(بەزەیی خوایی) دێت، مەبەستی لەو جۆرە سەرکردانەیە کە بەهرە و توانایەکی زۆریان هەیە لە راکێشان و کۆکردنەوەی خەلّك بێ ئەوەی ئامرازی دیسپلینی سەربازی یان پالّنەری پایە و مادە بەکار بهینێ ، بە پێی (ماکس ڤیبەر) ئەوانەی بەناوی خوا کاریان کردوە زیاتر توانیویانە ئەو پایە بەدەست بهێنن.

جیاوازی تر هەیە لە نیوان پادشای سیۆکراتی و سەرۆکی کاریزمی، لە کاریزما دەبوایە توانای خۆشی بکەوتبایە کار ،وهەندێ تایبەتمەندی وەك (..خۆراگری، دلّسۆزی بۆ بەها بەرزەکان و بۆ حزب وبۆ هاوپەیمانانی، زۆر ناسین، کەم پێکەنین، زۆر وزە، هێزی راکێشان، بێ لایەنی لەناکۆکیە ناوەکیەکان، ..) هەبوایە[*]، یان وەك (ماکس ڤیبر) دەلێ دەبوایە سەرکردەی کاریزمی سەرنج راکێش ورِوو خۆش(جاذبية الشخصية)بوایە، واتە لیزانین وهەلس وکەوتی تایبەتی خۆی لەگەل رەهەندیکی ئاینی یان (خارق العادە) کاریزمیەکەی بۆ تەواو دەبوو ،هەرچی سەرکردەی سیۆکراتی زۆر پیویستی بەو گوزارشە نەبوە بەلکو چاکی بکردبایە یان خراپ هەر دەووترا ئەوە سەرکردە(یان پادشا) خۆی وخوای خۆی دەزانن چ دەکەن ئیمە سەرمان لیدەرناچێ ،بەلام ئامانجی هەردوولای کاریزمی وسیۆکراتی لیك نزیك بوو لەبارەی قۆرخ کردنی دەسەلات وواتیگەیاندنی خەلك کە:( هیچ کەس بیر لەو پایەو دەسەلاّتە نەکاتەوە بۆ خۆی، گوێڕایەلّ و پابەند بێت بە فرمانەکانیان، بارێکی

---

[*] بۆ زیاتر برِوانە: (قاموس التحليل الاجتماعي) ص103.

دەروونی گشتی بسازێ کە هەرگیز ئەوانە سەرکەوتوون، بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەشی بەمیراتی قـەتیس بمێنێ تەنها بۆ ئەو بنەماڵە، هەرچی دەیکەن و دەڵێن پیرۆزی تێدایە) .

رای مەدرەسەکان : لەو بارەیەوە هەر سێ مەدرەسەی لائیکی یەکڕان کە سیۆکراتی بریتیە لە حوکمی دیین و دیکتاتۆری و پاشکەوتن، تەنانەت هەندێ ئایین پەروەرانی مەسیحی و ئیسلامیش دەڵێن ئایینی خودا حوکم نیە تەنها پەیوەندیەکی تاك و خودا و ئامۆژگاریە، قەشە (ولیام ثامیل)ی ئینگلیزی دەلیت(چەندە هەڵەیە ئەگەر واتێ بگەین خوا بە تەنها ئەو بوونەوەرە بەڕێوە دەبا) بەلکو بەشەر بەشدارە، (شێخ علی عبدالرزاق) (قازی شەرعی)ی ئەزهەریش لە ساڵی 1925 کتێبێکی نووسی بەناوی (الاسلام و أصول الحکم)، تیایدا دەلی: (ئیسلام تەنها ئاینی گیانە نەك دەوڵەت، پەیامی محمد هەرگیز دەوڵەت و حکومەتی تیا نەبووە)[919] ، تەنانەت مەزهەبی شیعەش شۆرش و سیاسەتی بۆ هاتنی (مەهدی) هەڵگرتبو تا پیش شۆرشی ئیرانی 1979، لەو سەردەمە زیاتر تەیاری سەلەفی نزیك لە سعودیە بەتەواوی ئەو ڕایەیان هەیە ، ئەوانە نەك دژی سیۆکراتی بەلکو دژی ئەوەش بوون حوکمی بەشەری سەرچاوە لە شەریعەت وەرگرێ ، ئەوەی سەروو زیاتر رای لیبراڵ دیموکراتیەکان بوە، کە ئەوان خۆیان بەپاڵەوانی ڕزگارکەری کۆمەڵگە دەزانن لە تاریکی سیۆکراتی.

هەرچی شیوعیەتە ئەوان لە لیبرال و سۆشیال دیموکراتەکانیش ڕەت دەدەن، باوەڕیان بەوەش نیە کە ئایین لە دەسەڵات و حوکم و سیاسەت و کۆمەڵگە بکشێتەوە بۆ ناو دڵ و دەروون و پەیوەندی بەخودا، بەڵکو باوەڕیان بەو خودایەش نیە و حوکمیان زۆر توندە لەسەر ئایین، چ جای سیۆکراتی ،پێیان وایە ئامرازێکە لەدەست چینی چەوسێنەر و داگیرکەر دژ بەچینی چەوساوە.

ئەوتێڕوانینانە دوایش بوونە مادەی دەستوری وئاینەکان کەوتنە دۆخیکی فەرامۆش کرابوو ، ئایین نەیەتە ناو دەولەت یان ئەوەی ئیستا پێی دەووترێ( ئاینی فەرمی وولات فلانە ئاینە )،لە پیش هەموان کۆنگریسی ئەمریکی[920] ،ئینجا لە مادەی 116ی دەستوری نەمسا ی سالە

[919] الاسلام و أصول الحکم ص64-68 .

[920] هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کـراوە) لەبڕگـەی(3)ی مـادەی(6) وا هـاتوە: یکـون الشـیوخ والنواب المشار إلیهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشریعیة لمختلف الولایات، وجمیع الموظفین التنفیذیین والقضـائیین التـابعین للولایـات

1901،زۆر وولاتی تریش،بەو دواییە گەیشتە وولاتانی کۆنە شیوعی ،لەوانە:مادەی16ی دەستوری بیلا روسیاسالی 1994،مادەی 11ی دەستوری ئەسیۆبی 1994،مادەی 14 ی دەستوری روسیای 1993، لەجیاتی مادەیەکی دەستوری وەك مادەی(2)ی دەستوری فرنسی تۆماردەکرا: فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو الدين وهي تحترم كل[921]، لەزۆر وولاتی تر بەشێوەی جیا وادەهات ، لەدیباجەی دەستوری هندی 1950،مادەی 8ی دەستوری ئەنگۆلیا،مادەی 7ی دەستوری ئازەربیجان ،مادەی 1ی کازاخستان،مادەی 1ی قرغیزیا،مادەی 1ی مەدگەشکەر،مادەی 1ی وولاتی مالی ،مادەی 14ی دەستوری روسیا،مادەی 1ی تاجیکستان،مادەی 20ی دەستوری ژاپۆن ، لەدەستوری تورکیاش زۆر خراپ تر .

ڕای مەدرەسەکان سەبارەت بە سیۆکراتی و لکاندنی بە دادگەری ئایین بەتایبەتی ئیسلام ناتەبایە، ئەوان مشت و مڕ و قوڵبونەوەی زۆرتری فەلسەفی و ئایینی و سیاسی و سۆسیۆلۆژی و ئەنسرۆپۆلۆجی ویستوە، بۆ ساغکردنەوەی ئاخۆ حوکمی ئیسلام سیۆکراتیە یان مەدەنی و گرێبەستیە، واتە دەتواندرێ خەلیفە،ئەمیر، والی، ڕابەری گشتی، سەرۆك...، لابدرێ بەدەنگی کۆمەڵگە و هاوڵاتی یان ئەو مۆڵەتی خودایی وەرگرتووە و ناکرێ دەستکاری بکرێت، ئەوەی ئەو پرسەی زۆر ئاڵۆزکردووە ئەزمونی مێژووی سیاسی مسوڵمانە، دەبینی بەدەگمەن نمونەیەك دەست ناکەوێ خەلیفەیەك بەدەنگی میللەت لادرابێت، یان بەمردن یان بە خوێن رشتن بووە، نمونەی سوڵتان (عبدالعزیز ومراد ی پینجەم وهەرەدوای عبدالحمیدلە 1909چۆنیەتی لادانیان بە زیندوویی دیارە ، لە سەردەمی ئەمەوی

---

المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

[921]دەستوری فرنسا لە4ی ئۆکتۆبەری 1958 دەرچوو 92مادە بوو، هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کراوە) لاگیری ئاینیە بەلام نەیکردۆتە مەرج وەك لەبڕگەی(3)ی مادەی(6) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

خەلیفەی موسولمانان (ولید بن یزید88-126ھ) شیعری هەیە گاڵتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتێ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەڵێ:

**تذکرنی الحساب ولست ادری احقاماتقول من الحساب**

**فقل لله یمنعنی طعامی وقل لله یمنعنی شرابی**[922]

کەچی تانەکوژرا لانەدرا،لەبەر ئەو تیگەیشتنە سیۆکراتیەی گوایە ڕووبەڕووبوونەوەی حوکم ڕووبەڕووبوونەوەی خودایەو گوناحە.

ئەو مێژووە و بارۆدۆخی فیقهی ئەو بۆ چوونەی مەدرەسەکانی عەلمانی زۆر موکوم کردوە، ئێستاش هەر خاڵی لاوازی بزوتنەوە ئیسلامیەکانە و پاساوی مانەوەی عەلمانیەتە لە جیهانی ئیسلامی، بەڵام لەلایەکی تریش هەندێ بنچینەی ئایینی زەق لە ئایەت و فەرموودە کە حوکمی ئیسلام سیۆکراتی نیە بەڵکو مەدەنی و گرێبەستیە لەگەڵ کۆمەڵگە (بڕوانە بەشی ئازادی لەو مەوسوعە) واتە حوکمی ئاسمانی و غەیبی نیە، حوکمی زەوی پەتیە، ئایینی ئیسلام وەك سیۆکراتی واناڕوانێ کە خودا لە ئاسمان حوکم بکا و مرۆڤیش لەسەر زەوی، بەڵکو لە بنچینەدا هەڵەی ئسوڵی هەیە کە لەو پەرەگرانەی ڕوون دەبێتەوە : (..فإن أمر بمعصیة فلا سمع ولا طاعة) ، هەروەها ( افضل الجهاد کلمة الحق عند سلطان الجائر).. لە ئاینی مەسیحی ویەهودیش (وەك ئەسل) سیۆکراتی رەتکراوەتەوە ،بەتایبەتی قۆناغی یەکەمی کە دەسەلاتدار خۆی یەکسان کردوە بە خوا ،تەنانەت ڕاڕەوی (تۆما ئەکوینی) وتەقەلاکانی خۆی ولەدوای خۆی بە بناغەی بەربەرەکانی سیۆکراتی هەژماردەکریت ،تۆخمە بنچینەییەکانی دیموکراسی لەو دێت .

وەرچەرخانی بۆ حوکمی مەدەنی

ڕای گشتی زانستی میژوو وایە کە سەرەتای کۆمەڵگە فرەئایینی ودەسەلاتی ئاینی و فرە خوایی هەبووە، ئەوانە زیاتر سەر بە مەدرەسەی پەرەسەندنن، لەوانە : مۆرگان، فریزەر، فیورباخ، هۆبز. مارکس، ئەنجلس،..پیشیان وابوە حوکمی سەرەتایی ئەو جۆرە بوە بۆ لە خشتە بردنی هەژارو

---

[922] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72

دانیشتوان ، هەر لەو فرە خواییەش دەسەڵاتی سیۆکراتی سەریهەڵداوە، چەند قۆناغیکی گەشەی مەدەنی ودوورکەوتنەوە لە ئاینیان دیاری کردوە ،لەوانە:

- ئۆگست کۆنت: لاهوتی- میتافیزیکی- زانست
- فریزەر: جادوو- ئایین- زانست .
- مارکسیەت: کۆمۆتی سەرەتایی-بەندایەتی-دەرەبەگی- سەرمایەداری- سۆشیالیستی- شیوعیەت.
- تەتەوریەکان: دڕندانەیەتی- خێڵەکی- ئیمبراتۆریەتی- پادشایەتی- کۆماری.

لەو قۆناغە سەرەتاییانە پاشا و ئیمپراتۆرەکان بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەهێز بکەن هەوڵیانداوە پیرۆزی بدەنە دەسەڵاتیان ،بۆ ئەوەی لەکاتی تەنگانەو بۆشایش دانیشتوانیان پابەندبن بە فەرمایشت و سیستەمی حوکمەوە، واباوبوە هەر پادشا و سەرۆکێك پیاوێکی ئایینی لە تەنیشت خۆی دادەنا، تاڕادەیەکی چاك سودیان لەو هەنگاوە بینی، بەڵام زۆربەی جاریش بەناوی خوداوە زوڵم و زۆری و حوکمی پشتاوپشت ودکتاتۆری کراوە، جاریش وایە ئەو ئەزمونە بگوازرێتەوە بۆ ئاینەکانی سەردەمیش، بەو شێوەیەدەسەلاتی جۆری سیۆکراتی زۆربەی میژووی سیاسی کۆن پێك دەهینیت، ڕاستیەکەی چەند قۆناغیکی بەخۆوە بینیوە بەلام وەك ئەو پۆلینانەی (کۆنت وفریزەرو مارکس..)نەبوە ،لە قۆناغی یەکەم پادشا پاگندەی ئەوەی کردوە کە خۆی خودایە (نەك مەولەتی خوای پیدرابیت) نمونەشیان لە رۆمەکان و فرعەونەکانی میسرەبە ڕوونی دەردەکەویٚ(فقال انا ربکم الاعلی)[923] لە هەندیٚ سەرچاوە دەلێن( سەرجۆنی ئەکەدی)یش داوای خوایەتی کردوە[924]،جارجاریش تا ئەو دواییە دووبارە بوویتەوە ،قەشە پۆسیوە بە لیکدانەوەی ئاینی بە پادشاکانی دەووت (ئەی شایەکان ئیوە خواوەندن)[925] ،قۆناغی دوەم خودا دەسەلاتی بە پادشاوبنەمالەکەیانی داوە وەك شایەکانی فرنسا لەسەدەی 17 و18 ،لە دیباجەی بڕیاڕیکی لویس پازدەمی سالی 1770 واهاتبوو:(ئیمە ئەو تاجەی سەرمان وئەو شمشیرەی دەستمان لە خواوە هاتوە ،تەنها بەرامبەر ئەویش

---

[923] سوره النازعات(79)ئایەتی 24 .

[924] بڕوانە : تأريخ حضارة وادي الرافدين.. - د.احمد سوسەص201

[925] **فلسفة الدولة ص**597

بەرپرسیارین ،بۆیە هەمو بڕیارو یاسایەك تەنها لەلای ئیمە دەردەچیت)[926] ،ئەو دوو قۆناغە لەلایەن ئاینپەروەرانیش ڕووبەڕوویان بووینەوە ،وانیە کە دەڵێن ئەوە قۆناغی ئاینی بوەو ئیستاش عەقلانی ، ئەو سەردەمیش چەند جۆرە ململانێیەك لە نیوان ئاین ودەسەلاتی سیۆکراتی هەبوە :1-ئەو جۆرە دەسەلاتەی بە شەرعی زانیوە وەك بانگی پیغمبەرەکان ،لەسەدەی 12 و 13 ناوەراست (زانستی لاهوت)دژبوە ، بەهەمان شێوە قەشە(تۆما ئەکوینی)و لایەنگرانی دژ بووینەو باوەڕیان وابوە یاساو دادگەری لای خودا دێت بەلام کێ بۆیان جیبەجێ بکات ئەوە لای میلەتە، 2- بەشیکی ترلە ئاینیەکان دژایەتیەکەیان بۆگرتنە دەستی دەسەلات بەتەنها بوو ، دەیان ووتوەك چۆن علمی شەیتان هەیە ئاواش حوکمی شەیتان هەیە ئەگەر لەدەست پاپاو قەشە نەبیت،قەشە پۆسیوە دەیووت مادام خوداشای هەمو شایانە دەبێ ئیمەش شای هەموان بین ،ئەگینا مەولەتی خوای پینادرێ 3-هەردوو دەسەلاتی سیاسیو ئاینی ریك دەکەوتن بۆ بەریوەبردنی دەولەت ،لەو میانەش ریککەوتن لەسەر ئەوەی فتوا بۆ ئاین وحوکمیش بۆ ئیمپراتۆرو سەرەتای عەلمانی لیرەوە هات ، قۆناغی سێیەم توخمی گەلیشی تیکەوت ،واتە هەم لەخوداو هەم لە گەلیش،ئەوەش لە دوای شۆڕشی پیشەسازی وڕابوون بەرەبەرە هاتە کایەوەلەگەل لاواز بوونی سیۆکراتی پەتی ،سەردەمی رێنسانسی ئەورووپی و هاتنی عەلمانی و عەقلآنی بە کۆتایی هێنانی سیستەمی سیۆکراتی هەژمار دەکرێت هەروەك(Encyclopædia Britannica) دەلێ ڕینسانس کۆتایی بەو سیستەمە هێنا،تا ڕووخانی هەر چوار ئیمپراتۆریەت(عوسمانی —روسی-ئەلمانی-نمسا) لە جەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918) ئەو جۆرە دەسەلاتە بە یەکجاری تەواو بوو ، زیاتر ترازی عەلمانی بالی بەسەر جهان کیشاوە، واتە لایەنی بەرامبەر بە سیۆکراتی وتاڕادەی کاردانەوە .

یەکەم جار سیکولاری لە جیاتی سیۆکراتی بەرەسمی لە سالّی (1648) لە مۆرکردنی ئاشتی (وستڤالیا) بەکارهات کە دەولّەتی نەتەوەیی پێ دروست بوو لەجیاتی سیوکراتی،4 دەولەت دروست بوو (بریتانیا-فرنسا-هۆلەندا-ئیسپانیا)، یەکەم کۆماری عەلمانی (نا سیۆکراتی) لەدوای شۆڕشی 1789 لە فەڕەنسا دروست بوو، کاریگەری شۆڕشی ئەمریکاش لەبینا کردنی دەولەتیان ڕوون تر

[926] فلسفة الدولة ص576

لەوە دێت کاتێ جیفرسۆن ڤیتۆی دژ بە سیۆکراتی مەسیحی بەکارهیناو دەستور جێی بنەماکانی مسیحی ودەسەلاتی کنیسە گرتەوە، بوە هۆی لێك جیاکردنەوەی تەواوی ئاین لە دەولەت بەشێوەی فەرمی دوایش ناوی نرا(اعلان الحقوق)،  ئیتر زۆربەی زانا و فەرهەنگە کۆن و نوێکان ئەو بەرواره بە سەرەتایی کۆتایی سیستەمی سیۆکراتی دەژمێرن[927]، هەنگاوی کۆتایش لە پەیماننامەی لاتران لە نیوان مۆسۆلینی وپاپا لە 11ی فبرایەر1929 تیایدا واهات(مروڤ پیش لەدایك بوون مولکی پاپا بیت،دوای لەدایك بوونی دەبیتە مولکی مۆسۆلینی تازیندووە لەدوای مردن ببتەوە مولکی پاپا)[928]. کۆتایی بەودەسەلاتە کلاسیکیە بە یەکجاری هێناو بوە هۆی دەسەلاتی هاوبەش ببتە میرات بەو شیوەیە ، ڤاتیکان لە ئیتالیا بۆ ئاین دیاری کراو باقیەکەی تریش بۆ سیکولارو سیۆکراتی لیرەوە کۆتایی دێت .

هەندیکی بە هۆی شۆڕشەکانی زانست وزانیاری و مەدەنی وپرۆسەی سپی وسەوز گۆڕدران، هەندیکیش بە توندو تیژی وشۆڕشی سور گۆڕدران وهەردوو تەوەری سیاسی و ئاینی (سیۆکراتی)بە سزاو وریسای(دیدرۆ)یان بەسەر سەپاندن کە دەیووت: دوا پاشایان بە ڕیخۆلەی دواقەشە بخنکێنن[929]، ڕێسایەك لەلایەن (رۆبیرت مایکل زلە 1912 داڕژرا دەلێ هەر دەسەلاتیکی ستاتیکی (نەگۆڕ) با لەسەرەتادا بە (کۆ)ش بێت، بەرەبەرە لاردەبێتەوەبەرەو تەسکی ودەکەوێتە دەست کەمایەتی،بەجۆریکی تر(رۆبیرت میشلیز)دەلێت زۆربەی سەرکردە حزبیەکان جم وجۆلی سیسیان لەسەرەتا بە کۆدەنگیە بەلام بەرەبەرە لاردەبنەوە بۆ تاك ڕەوی وئۆلیگارکی وبەرژەوەندی شەخسی، ،بۆیە دەست گۆڕی دەسەلات چارەیە ئەگینا بەڕەوتی سروشتی بەرە بەرە لە زۆرایەتی وبۆ کەمایەتی لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك لە چەند کەسێك بۆ تاکە کەس ،ئەو ڕێسایە پێی ووتوە (قانون اقلیە

---

[927] کتیبی (تیارات الفکر العربی المعاصر ص204) زیاتر بەلای شۆرشی فرنسیە نەك شۆرشی ئەمریکی .

[928] بروانة : الإسلام والعلمانية واثرهما فی نسأة الدولة العراقية الحديثة . **هەروەها: القاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3 ص1035**

[929] دەلین لە بنەچەدا ئەو قسەیە هی (قەشە جان میسلی)ە کە لە وەسیەتنامەکانی خۆی نوسیوبوی ،قەشەیەکی فرنسیە سەرەتای سەدەی 18 مردوە ئەو وەسیەتنامانەی بەجیهیشتوە .

الحديدى)[930] . له (موسوعه الميسره) ناوى ناوه (القانون الحديدى للاوليكاركيه- iron law of oligarchy) دەلى بە سروشتى بەشەرى كارەكان لە بەكۆمەلەوە بەرەو كەمايەتى ولەويش بۆ تاكە كەس دەچێت[931]،لەوەوە فلسفەى دەست گۆڕى دەسەلات هاتتە كايەوەكە بنچينەى ديموكراسيە،لە ڕاستيدا زۆربەى ديكتاتۆرە مۆنۆكراسيەكان بەو شێوە هاتون، لەو دواييەش دەولەتى (حزب القائد)يش هەمان ڕێڕوى وەرگرت، دەولّەت لە ژێر فەرمانى حزبێك بووە، حزبيش لە ژێر فەرمانى ئەنجومەنيك بوە ،ئەنجومەنيش لە ژير فەرمانى تاكە كەسێك بووە بە ناوى (ڤۆهر – رابەر )، ئەوەش هەمان پىّ ناسى (ئتحاد الترقى)تورانى توركيە، كە وەسفى وادەكرا :هەموو عوسمانى لەژير دەستى ئيتحاديەكان، ئەوانيش لەژير دەستى مركز عام و ئەويش لەژير فەرمانى أنورپاشا ، هەمو ئەزمونەكانيشيان بە كارەسات وتراجيديا دەگەيشت ، يەكەم جار زانايانى ئاينى(ئەو بەشەى تيكەلى دەسەلات نەبوە) دژى ئەو شێوە دەسەلاتە وەستاونەوە ، رۆلى ئاين لەو وەرچەرخانە فەرامۆش كراوە كەچى زۆر گرنگ بوە ، هەريەكە لە ئەكوينى وپلارماو سواريز بناغەى ئەو وەرچەرخانەيان داڕشت بەوەى كە دەسەلات ناڕاستەوخۆ لە خواوەيەوڕاستەوخۆ لە ميلەتەوەيە ،پاپاليۆى سيزدەم لە1892 لەنامەيەكى بۆ كاردينالەكان دەلىّ : ئەو بۆچوونەى ئەكوينى ڕاست ودروستەو دژى سيۆكراتى وەستاو، توخمى ديموكراسى لە بۆچوونانە پەرەى گرت، تەنانەت كالڤينيەكان (كە لە كالڤن1509-1564ز هاتوە) پێيان وايە دادگەرى و زۆردارى دەسەلاتداران(بە سيۆكراتيەكانيشەوە )بەگەڕانەوە سەر پەيڕەو كردنى حوكمى خواى (كە لە ئينجيل وپيشووتريش لەتەورات هاتوە)بەكورتى داوايان دەكرد (على الإنسان أن يطيع الله لا الملوك والأمراء)[932] ، شان بەشانى ئەوانەش زانايانى مەدەنيش دژى وەستان ،جۆن لۆك بەتوندى وەلامى (روبيرت فيلمەر)ى دايەوە سەبارەت بە تيۆرى پشت بەستو بە تەورات وئاين بۆدروشمى(شاى ئينگلترا لە جياتى ئادەم حوكم دەكا) ، ڕابوون لەهەمو ئاستەكان بەرپا بوو ،زانستى –فكرى –پيشەسازى-ئابوورى –كۆمەلايەتى- فەرهەنگى –ياسايى ئينجا

---

[930] (المعجم الحديث للتحليل -p 226- Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts السياسي)

[931] موسوعة الميسرةللمصطلحات السياسية–جزء(ق) ص32

[932] عبدالوهاب **الكيالي, موسوعة السياسة ج5 ص134** .

ئاینیش بوه هۆی وەرچەرخان لە سیۆکراتیەوە بەرەو مەدەنیەت ودیموکراسیەوە ،پەڕیەوە لە وولاتان یەکەبەیەکە بۆ ئاستی نیودەولەتی، ئەو ئەزمونەی کە لەکۆمەڵگەی مەدەنی و بەرپاکردنی سیستەمی جیهانی لە (یاسای نێودەوڵەتی) و دامودەزگا یاسایی و سیاسیەکان و حقوقی وەك نەتەوەیەککگرتووەکان و دادگای نێودەوڵەتی و مافەکانی مرۆڤ.. بە هۆی تەقەلای هەریەکە لە : توماس هوبز (1588-1679) وجون لوك (1632-1704) وجان جاك روسو (1712-1778) ومونتیسکیو (1689-1755) وفولتیر (1694-1778). ..داویانە بۆ بنەمای دەوڵەت لە سیۆکراتیەوە بۆ گرێبەستی مەدەنی ، لەو سەردەمە دیموکراسی بوویتە سیستەمێك هیچ لایەکی فەرمی نەماوە نکولی لێبکات ،بەتایبەتی کە ئیسلامیەکانیش دوای ماوەیەك لە خۆپاریزی ئیستا وا پەیڕەوی دەکەن ، ،ئیستا دیموکراسی لە خانەی (کوفرو ..)دابەزیە بۆ بەشێك لە خواستی ئیسلامی ، بۆیە باسی دادگەری ئاین و سەرهەڵدانی بزوتنەوە ئاییینیەکان سیۆکراتی نیە هەروەك یەکسەر هەندێ ئەکادیمی و لائیکی و رۆشنبیران و ئەفەندی بە سیۆکراتی لێکدەدرێتەوە، لەلایەکی تریش کۆتایی سیۆکراتی کۆتایی ئاین نیە وەك هەندێك وای وێنا دەکەن ، مارکس دەلێ (إن ما يسمى بالدولة المسيحية إنما هو النفي المسيحي للدولة أما الدولة الديمقراطية، الدولة الحقيقية فهي لا تحتاج إلى الدين من أجل اكتمالها السياسي)[933]. بەهەمان ئێوە (نیتچە)دەلێت مسیح بە خۆی یەکەم مسیحی و دوا مسیحیش بوو..واتە لەدوای خۆی مسیحیەت نەبوە، لەو ڕوەوە هۆبز باشتر لەوانە بۆی چوە ،هۆبز لەبەرامبەر ئاین مەدەنیەتی بەکار نەهێناوە بەلکو لەبەرامبەر دەولەتی سیۆکراتی دەولەتی مەدەنی بەکار هێناوە[934] ، لەو سەردەمە ئەهلی ئاین کیشەیان لەگەل مەدەنی هەر نیە ، لەگەل دیموکراسیش تاڕادەیەکی باش ، گشتی لە ڕیسایەك دەنوێنرێت ئەویش گەڕانە بەدوای چارەسەری کیشەکانی ئادەمیزادی نوێ بەدادگەریانە .

**(30)**

## مافی مرۆڤ حقوق الانسان Human Rights

---

[933] کارل مارکس- فی مسأله الیهدیه ص12

[934] توماس هوبز-اللفیاثان الاصول الطبیعة والسیاسة لسلطة الدولة ص528

ئەوانەش دەگریتەوە(ستۆیری،ماگناکارتا، یا**ساکانی سۆلۆن،**کۆیلە(بەندایەتی)

چەمکیکی زۆرفراوانە لەبەرامبەر ئەو هەمو بێمافیەی بۆ هەندێ پۆلی بەشەری لە غەوارەو هەژارو بێکەس وکۆیلەو ئافرەت ودیل وکەنیزە ،جاران بەو مافانەی دەووترا کە پیویستن بۆ ژیانی مرۆڤ ،بەلام ئیستا مافەکانی لە (پیویستی-حاجیات)پەڕیتەوە بۆ هەندێ (تەواوکاریش-کمالیات)بە پێی گەشەی ژیانی سەردەم، واتە مافەکلاسیکیەکان زیاتر بایۆلۆجی بوو ئەوەی ئیستا بەرەو ئایدیۆلۆجی وسۆسیۆلۆجی چوە،مافە سیاسی ومەدەنی وئابووری وکۆمەلایەتی وفەرهەنگی دەگرێتەوە ،لە بەشداری سیاسی ئازادی بیروڕا وکارکردن وجۆری کەلتوورو..،کۆدەنگی لەبارەی هەبوە وهەیە بەلام هەریەکەو بەجۆریك دەیهێنێتەدی ،بۆیە ئەومافە زۆر کۆنە هیچ ئاینیك نیە بۆ ئەو مەبەستە نەهاتبێت،ناگەڕێتەوە بۆ جاڕنامەی سالی 1948 ، بە پێی زۆربەی سەرچاوە بالاکان ئەو مافە بۆ دەقەکۆنەکان دەگێڕنەوە لەگەل سەرهەلدانی بەشەریەت ،بە دیویکی تر بۆ ئاین دەیگێڕنەوە ،هەندی بنەما لە مانۆی هندی لە هەزارەی پیش زاین بۆ مرۆڤ دیار کراوە وەك زیان بەخش ،ئەو مافە بەزەقتر لە بنەما فکری وئاینیەکانی زەردەشتی رەنگی داوەتەوە ،سەردەمی چینی ومسیحی و تا ئاینی ئیسلامیش ئەو تێڕوانینە زۆر کۆنە لە  ئەدەبیاتی یۆنانی و(ولقد كرمنا بني ادم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا ) ئینجاماگناکارتاو هەردوو شۆرشی فرنسی وئەمریکی ،ریکەوتنامەی برلینی1855 وبرۆکسل 1890پاریس 1904  لاهای 1912 ولندن1914 .. دوای کەوتە نێو دەستورەکان وبڕیارەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان مادەی 2ی میساق تاگەیشتە جاڕنامەکە لە 1948 زۆر بڕیاڕی تری ماف لەوانەش مافی چارەنوس ،لەهەردوو عەهدی دەولی ( العهد الدولى الخاص بالحقوق المدنيه والسياسيه) و(العهد الدولي الخاص بالحقوق الاقتصادية والاجتماعية والثقافية) زۆری تریش هاتوون،هەمو ئەوانە پێی دەووترێ مافی مرۆڤ.

بەپیی هەندی تویژینەوە مافی مرۆڤ لەگەل مافی دەستوری ومافی هاولاتی بوون ودیموکراسی و لیبرالی و لە مافە سیاسیەکانی لیکجیان ،ئەوەی مرۆڤ دەگاتە ئاستی مافی پیویستی [935].

[935] قانون الشعوب- ص97 .

هەندی پیناس: لەبەر ئەوەی مافی مرۆڤ مادەیەکی گشتیە کەمتر ناکۆکی لەبارەی هەیە ،ناکۆکی لەبارەی چۆنیەتی هینانەدی هەیە نەك لەبارەی ناسینی ،بۆیە چەند پیناسێك هەلدەبژێرین :

+ بریتیە لەو کۆمەلە پیویستیانەی بۆهەرمرۆڤیك سازبکریت بەبێ جیاوازی ،هەمولایەکیش پابەندی پیبکەن چ وەك دەولەت چ وەك دەزگای تر[936] .

+Stanford Encyclopedia of Philosophy : بریتیە لەو مافانەی هەموکەس بۆ بەردەوامی ژیانی نوێی پیویستیەتی .

+ ئەندلەر باسی لە مافی مرۆڤی پرۆلیتاری کرد لەسالی 1927 وای پیناسکرد: ناوەندیەتی مرۆڤ ورزگارکردنی لە هەمو جۆرە چەوسانەوەیەك کەبەناوی ئاینی و سروشتی وبەشەری هەلخەلەتاندنی تر دەکرێ .

+ موسوعە الماركسيە: نسق من الآراء المبنية على احترام كرامة الإنسان والإهتمام برفاهيته وتطوره الشامل، وخلق الظروف الملائمة للحياة الاجتماعية[937].

+ الموسوعە العربيە العالميە: حقوق الإنسان الحقوق المستحقە لكل شخص لأنە إنسان. ويستند مفهوم حقوق الإنسان على الإقرار بما لجميع أفراد الأسرە البشريە من قيمە وكرامە أصيلە فيهم، فهم يستحقون التمتع بحريات أساسيە معينە

+ Encyclopædia Britannica Article: rights that belong to an individual or group of individuals as a consequence of being human. They refer to a wide continuum of values or capabilities thought to enhance human agency and

---

[936] 1–حقوق الانسان فى العالم المعاصر 2–حماية حقوق الانسان –ادم عبدالجبار ص20

[937] موسوعة الماركسية– (المادة: المذهب الإنساني)

declared to be universal in character, in some sense equally claimed for all human beings[938]

مافیكه بە تاك وكۆمەل بۆ هەموبەشەریەت بەشیوەیەكی یەكسان لە هەمو جیهان .

+(حقوق الإنسان ) هي : مجموعة الحقوق الطبيعية التي يمتلكها الإنسان واللصيقة بطبيعته والتي تظل موجودة وان لم يتم الاعتراف بها ،بل اكثر من ذلك حتى ان انتهكت من سلطة ما"(تيسعي).

+ ويعرف باحث اخر حقوق الإنسان بأنها " الحقوق اللصيقة بالإنسان والمستمدة من تكريم الله لـه وتفضيله على سائر مخلوقاته والتي تبلورت عبر تراكم تاريخي مـن خـلال الشـرائع والأعـراف والقـوانين الداخلية والدولية ومنها تستمد وعليها تبنى حقوق الجماعات الإنسانية في مستوياتها المختلفة شعوبا وامماً ودولاً"(برشعي).

+ حقوق الإنسان في أن يكون حرا من القيود التي يراد فرضها عليه لان الحقوق ( وسيلة ) نفسها ليست الاحريات ( هدف ) معترف بها ومحمية بشكل ما .

ڕیشەی :

لە مێژوودا گەلێ جار مرۆڤ بە قێزەوەن ترین شێواز چەوسایتەوە ،لەهەموان خراپتر پرسی كۆیلایەتیەو بەندەیی بوە كەهەمو ئاینەكان دژی وەستاون،كەچی لەدوای پەیامەكان گەڕاونەوە سەری ،مێژوەكی پڕمەینەتیان بۆ دروست كردوە دوور لە ئاین ومافی مرۆڤ .

وەك باقی منهجی تویژینەوەكانی تریان ئەوروپیەكان ڕیشەی مافی مرۆڤ بۆ هەندی دیكۆمینتی كۆنی ئەوروپی دەگێڕیتەوە ، زۆربەی نوسەرانی لای خۆشمان بەدوای ئەو پیخوستەی ئەوروپا گوزەر

---

[938] Encyclopædia Britannica- Article: human rights

(تيسعي) د. محمد سعيد مجذوب ، حقوق الإنسان والحريات الأساسية ،(لبنان ، جروس برس ، 1980) ، ص9 .

(برشعي) صلاح حسن مطرود ، السيادة وقضايا حقوق الإنسان وحرياته الاساسية ، اطروحة دكتوراه ، غير منشورة ، كلية العلوم السياسية ، جامعة بغداد ، 1995 ، ص39 . ولقد وردت فيها العديد من التعاريف لـ (حقوق الانسان) ، ص ص 37–39 .

دەكەن ،بەو هەنگاوەش میژووی ڕاستەقینەی نادۆزریتەوە كە ئاینە،هەروەك لە 4 قۆناغی گەشەی مافی مرۆڤ تۆماركراوەكە بریتین لە(نەریتەوە بۆ یاسا لەوێشەوە بۆ دەستور وئیستاش بۆ یاسانێودەولەتیەكان)،ئەوەش ڕوونە كە هەلقولاوی تیڕوانینە كلاسیكیەكەی تیۆری پەرەسەندنە.

ئەوان دەلێن سەرەتا ماف مانای نەبوو لە كۆمەلگەی سەرەتای، رۆلی هێز هەبوو نەك ماف،یەكەم بنەمای مافی مرۆڤ لە كۆمەلیك زاناوفەیلەسوفی یۆنانی كۆن دەدۆزنەوە كە پێیان ووتراوە (ستۆیریەكان) 300پ ز، لە (موسوعەلالاند ) واهاتوە كە لای( پرۆتۆگراس )مرۆڤ پیوەربوە بۆ هەمو پێوانەیەكی تر ـ مانای سەرەتای مافی مرۆڤ لەوێ دێت[941]،بەشیكی تر رەهەندی مافی مرۆڤ بۆ یاساكانی حمورابی و بەشیكی تر بۆیاساكانی سۆلۆن(سەدەی 6ی پ ز)ی ئەگریكی، ئەوەی ڕوونە 6 بنەما لە 48پ ز لە دادگاكانی رۆم تۆماركرابوون كە تیایدا باس لە مافی سروشتی مرۆڤ دەكا ،گوایە هاوولاتی بوونی یەكسان بوەدوای جۆن سانتیر(بەلگەنامەی ماگناكارتا)یدەركردلە 15/ 1215/6ز ئەو مافە بە گەیشتە قۆناغیكی بەرز،كە لە 63 مادە پێك هاتبوو،هەقی چینەكانی سەروو لە (ماقوولان، پیاوانی ئاینی، بازرگانەكان، بیانیەكان..) سنوردار كرا، دانی پێهێنا كە خەلكی تریش دەسەلاتی هەیە شان بەشانی دەسەلاتی (مەلیك) لە ئەنجوومەن ،ئەوە بە سەرەتایەكی ئازادی ودیموكراسی ومافی مرۆڤی هاوچەرخ دەژمێرن،،چاكسازیە ئاینیەكانی مارتن لۆتەر(1483-1546) ڕەهەندی مافی مرۆڤ جاریكی تر گەڕایەوە گۆڕەپانی ئاین،دوای بوە بەشیكی (نەریتی دەستوری)لەو وولاتە، لەسالی 1687یش جیمسی یەكەم یاسای (لیبوردنی)جاڕدا لە نێوان ئاین ومەزهەبەكان، لە (قصة الحضارة)بەرواری دەركردنی ئەو یاسایەی بۆ رۆژی 1687/8/4 گێڕایتەوە[942]، پەیمان نامەی ویستیفالیا (WEST PHALIA)-1648ز و شۆرشی فرنسی 1789 وكۆمەلیك لە زاناو فەیلەسوفانی وەك( -رۆسۆ-لۆك-فۆلتیر- )رۆلی گرنگیان بینی لە خەملینی ئەو مافە لە هەر 3 ئاستی یاسایی دەستوری ونیودەولەتی،لەلایەكی تریەكەم جارلە جاڕنامەی سەربەخۆی ئەمریكا1776 مافی مرۆڤ وچارەنوس پیكەوە بەستراو بوە بنەمای دروست بوونی دەولەت،

---

[941] موسوعةلالاندالفلسفية ج1 ص568 .

[942] ويل ديورانت - قصة الحضارة ص 10917 -عصر لويس الرابع عشر -إنجلترا - الثورة الجليلة - الملك الكاثوليكي.

دەقەکەی: ( إعلان استقلال امريكا 4 يوليو عام 1776م: نحن نعتبر هذه الحقائق بديهية:1- إن الناس جميعًا خلقوا متساوين، وإن خالقهم حباهم بحقوق لايجوز الافتئات عليها، وإن من هذه الحقوق حق الحياة، والحرية، والسعي وراء السعادة. 2-,وإنّه تأمينًا لهذه الحقوق، فقد أُنشأت الحكومات مستمدة سلطاتها العادلة من موافقة المحكومين ) ، له بنەماکانی شۆرشی فرنسی 1789 جارڕنامەی (**إعلان حقوق الإنسان والمواطن** – پیکهاتبوو له 17مادە لەلایەن (ئەنجومەنی نیشتمانی فرنسی) وەك جارڕنامە لە 26ئۆگستی 1789بەرجەستەی کرد(هەرچەندە لویسی شازدەم پێی رازیش نەبوو ) ،دوای لە 1791ز لە دەستوری فرنساش چەسپا، تۆماس پین لە1791(حقوق الانسا)ی بلاوکردەوە لە بریتانیاکاریگەریەکی زۆری لەسەر ئەدموندبیرك لە فرنسا وجون لوك وئادم سمز کردبەو ئاڕستەیە [943]، ئەو هەنگاوانە شان بەشانی سەرهەلدانی مافی ئافرەت وقەدەغەی کۆیلەداری(یەکەم جار لە بریتانیا لە1833دەستی پیکرد) وبازرگانی بە مرۆڤ وهەنگاوی تر گەیشتە ئاستیکی بەرز ، دوای لە ئەنجامی هەردوو جەنگی جیهانی وهاتنی سیستەمی نوێی جیهانی بە فەرمی لەنەتەوە یەکگرتوەکان جاڕی مافی مرۆڤ درا لە سالی 1948ز کەلەخواروو باسی دەکەین .

هەلسەنگاندن: مافی مرۆڤ زەمینەیەکی ئەخلاقی و ویژدانی هەیە ،ناگەڕێتەوە بۆ ئەو بەروارەی سەروو بەلکو لەگەل هاتنی یەکەم بەشەر هاتوە ،بەهەمان کات پیشیلکاریشی هەمان سەردەمی هەیە،مادام ناخی مرۆڤ هەردوولای چاکەو خراپەی تیدایە(فالهمها فجورها وتقواها ) ،هەرئەوروپیەکان لەو ڕوەوە بەهەلەدا نەچووینە  هەندێ لە عرب  (مافی مرۆڤ)دەگێرنەوە بۆ(**حلف فضول**)کەلەپێش ئیسلامدا کرا پاشان پێغەمبەر (د.خ)تصدیقی کردووە بەلام ئەوە زۆر سادەیەو زیاتر بە یاسای نەفامی (انصراخاك ظالما اومظلوما)..کاری کردوە[944] ، هەر لە ئەسلدا ئاینی کۆن ونوێ  ناوەرۆکی شریعەتەکانی مافی مرۆڤی تێدایە ، ئینجا لە یۆنانی کۆن وهاوولاتی یەکسان لە ئیمپراتۆریەتی رۆم نەهاتۆتە دی ،بەلکو جیاوازی ڕوون لە نیوان تویژە کۆمەلایەتیەکان هەبوە ،هەرچی لە (ڕۆم)نەبوایە بە (بربر)یان لەقەلەم دەدا، تەنانەت وەك (شیشرون 106- 43پ ز) لەسەر زاری (هیرودوتس –کەبە

---

[943] بۆکاریگەری ئەوانە بڕوانە:معجم المؤلفات السياسية ص301–

[944] ئەو یاسایە زۆر نەفامی بوو دوای ئەوەی(پیغمبەر-دخ) ناوەڕکەکەی هەموارکرد بوە یاسایەکی مرۆڤانە .

باوكی مێژوو)جەنگی نێوان ئاسیا وئوروپی بەجەنگی بەربەرو وشارستانی لە قەلەم داوە، یان وەك (هیرمن كیندر)دەلێت ململانێی هیلینی و بەربەری[945] ،هاوولاتی بوون لە چوارچیوەی (بەهێز و بیٚ هێز)، (غەریبە و هاوولاٚتی)، (رەش و سپی)، (بەندە و خاوەن)، (دەوڵەمەند و هەژار)، (دەسەلاٚتدار و بیٚ دەسەلاٚت)، (رۆمی و نا رۆمی-بەربەر)، (رەسەن و ئیسنی)، (پیاوانی ئاینی و ئاسایی) دیاری كراوە ، مانای هاوولاٚتی تەنیا چینەكانی سەروو وماقولەكانی دەگرتەوە، چینەكانی هەژارو بەندە و ئافرەت وغەوارە و ڕەگەزە بیٚ هێزەكانی نەدەگرتەوە، كەمایەتیەكی دەگرتەوە ، بە پیٚی زۆربەی سەرچاوەكان ژمارە ی دانیشتوانی ئەوسای(ئەسینا) 30000 كەس بووینە بە پێی مانای ئۆرستكراتی بۆ هاوولاتی تەنها 3000 لەو دانیشتوانە بۆ دیموكراسی گرتووتەوە كە زانایانی ئەو سەردەمە بە تایبەتی (ئەفلاتون) داوای بۆ كردووە،تەنزیریشی بۆكراوە لەلایەن زاناو فەیلەسوفانیانەوە، هەریەكەلە ئەفلاتون وئەرستۆ باسیان لەوە كردوە كەهەموو مرۆڤ لە قوڕن بەلاٚم قوڕەكەی گەلی یۆنان زێڕیشی لەگەڵ بوە ،بۆیەهەموو مرۆڤەكان یەكسان نین، ئەرستۆبە پیچەوانەی ڕێسای ئاینی دەلێ (الناس ليسوا متساوون كأسنان المشط)، دەلیٚ پێكهاتەی جەستەی بەرپرسان لەزێڕەو هی هاوولاٚتیش لە تەنەكەیە، پلەیان جیاوازە وەك ڕۆمی كۆنو براهما وشادرای هندین.

ئەگەرچی ئاین پیشەنگە لەمافەكانی مرۆڤ ،لەهەمو ئاینەكان،زۆربەی ئەو بنەما مرۆڤایەتیەی هەستی پێناكەین(وەك هاریكاری وبەزەیی و بەهاناهاتن و..) ئەوە ئاینە وای كردوە ببێتە نەریتی كۆن ، بە چاوێكی جیهانی بنواڕنە مرۆڤایەتی، بۆیەش بیرۆكەی(كۆسمۆپۆلیتی)زۆر كۆنە بەمانای یەكسانی مرۆڤەكانی جیهان،یان هاوولاتی جیهانی و گەردوونی ، دژی كەلتورو ناسنامەی دەڤەریە ،باوەڕی بەحكومەتی جیهانی وكەلتورو ناسنامەی جیهانیە ، لینین دان بەوە دەنیٚ كە دروشمی جاران (هەمو مرۆڤایەتی برایە)هەبوە ئەوان گۆڕیویانە بۆ (برایەتی چینی كرێكار)[946].

---

[945] هیرمن كیندر وفیرز هلغمان -تأريخ العالم- Dtv- تعريب :ألياس عيدو الحلو ط3 \2003 ص58.

[946] لينين –المختارات ج1 ص542 .

تیڕوانینی مرۆڤایەتی جیهانی بناغەی مافی مرۆڤیشی لەگەل دەبێت،بۆیە ئاساییە یەکەم جار لەلای ئاین هاتبێت ،وەك لة (الأصحاح السادس عشر من سفر أستير –عهدالقديم –التوراة- تتمة سفر أستير 7: 4) بة ڕاشكاوانة باسي مافی مرۆظ دةكات وهاتوة : (وَلاَ يَكْتَفُونَ بِأَنْ لاَ يَشْكُرُوا عَلَى الإِنْعَامِ وَأَنْ يُنَابِذُوا الْحُقُوقَ الإِنْسَانِيَّةَ، بَلْ يَتَوَهَّمُونَ أَنَّهُمْ يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يَفِرُّوا مِنْ قَضَاءِ اللهِ الْمُطَّلِعِ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ)، بەهەمان شێوە لە ئینجیلیش واهاتوە (إنجيل مرقس 2: 10

وَلكِنْ لِكَيْ تَعْلَمُوا أَنَّ لابْنِ الإِنْسَانِ سُلْطَانًا عَلَى الأَرْضِ أَنْ يَغْفِرَ الْخَطَايَا) ( إنجيل مرقس 2 : 27) ثُمَّ قَالَ لَهُمُ: «السَّبْتُ إِنَّمَا جُعِلَ لأَجْلِ الإِنْسَانِ، لاَ الإِنْسَانُ لأَجْلِ السَّبْتِ).

لە قورئان وفەرمودەش بە هەمان ئاڕستە داکۆکی لەمافی مرۆڤ کردوە ،لەکاتێك بوە کە مرۆڤ کۆیلە کراوە ،رۆژانە 3 جار لێیان دەدرا تابەبیریان بێتەوە کە ئەوان مرۆڤی تەواو نین بەلکو عەبدن ،جاروابوو لەسەر هەلەیەك پەنجەو دەستی کوڕەعەبدێك لە پیش چاوی باوکی دەبڕدرا لەلایەن خاوەنەکی بێئەوی مافیکیان هەبێت ،ئاین لەو تاریکستانانە بانگیشەی مرۆڤایەتی کردوە ، ئەوە دەقی ئاینیە ،ئیتر ئاین وئاینپەرەوەر لێکجیایە ، موسولمان وئیسلام لێکجیایە ، ئیسلام ومیژووی موسولمان لێکجیایە ، لە میژووی ئاینیش چەوسانەوەی مرۆڤ بەدی دەکرێ ،ئەکەر چی دەقی ئاینی یەکسانی هیناوە (يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم ان الله عليم خبير)کەچی لەناو عەرەبیش جارێکی تر نەفامی (زالایەتی مرۆڤ بەسەر مرۆڤی تر ،میلەت بەسەر میلەتیکی تر ..هێنرایەوە ، ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرمموودە)ی وەك (حب العرب ايمان)، **(العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)**، لە کتێبی (العروبه بين الشعوبيه والإستعمار)دەلێ ئەوە ئیسلام پیویستی بە عرب هەبوە نەك عرب پیویستی بە ئیسلام هەبیت ،تا گەیشتە ڕادەی مارەیی عەرەب لە عەجەم نەهاتوە،چەندین زاناو مەزهەبی گەورە لەوبۆچوونە هەلەیە تێوەگلاۆن ، لە کتێبی(**مسبوك الذهب فى فضل العرب-** بە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەکا)، حَدَّثَنَا سَعِيد بن أسد ، حَدَّثَنَا ضمرة عن ابن شوذب قَال: تزوج بن سيرين(كوردى) عربية وكره الموالي لما يدخلهم من السيي. قَال: فذهب بن عون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه

وفرق بينهما ، قال له: طلقها. قَال: هي طالق. قَال: ثلاثًا قَال: واحدة تبتها. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يبتها. وقال له: طلقها. قَال: هي طالق ثلاثًا. قَال: واحدة. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يفتيني بطلاقها[947].

لەزۆر سەرچاوەی تری فقهی بە ڕوونی دەری دەخا کە بەشیك لەئەهلی سونە وجەماعە پێیان وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیە ، هەروەها(المعرفه والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوی)ئەو سەربردەی تەلآقەکە باس دەکا،شيخ الإسلام ابن تيميه - دەلی : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهم)[948]دەشلێن عەرەب عاقل ترن عەجەم و میلەتانی تردەبێ لە خزمەتیان دابێ..لەوەش زیاتر دەلێ دەبێ لایەنگریان دەڵێ: (...كما أن جنس العرب يستحق من المحبة والمولاة ما لا يستحقه سائر اجناس بنى ادم)[949] ...بەلام هیشتا مافی مرۆڤ (هەژاری ولیقەوماوی پەککەوتەو دیل و..)لەلای مێژووی ئاینی ریزدار تر بوە نەك ئیمپراتۆرە لائیکیەکان(یان بەشەری پەتی)، لە مەشروتیەی عوسمانی وهەردووخەتی گولخانەو همایۆنی سەرەتایەك لەو مافانە بە دیکۆمینتی ئەکادیمی ویاسایی هاتوە ، فەرمانەکانی عوسمانی بەناوی (خەت همایۆنی )دەرچوەلەلایەن سولتان عبدالمجيدمۆرکراوە لە 1856/2/18 بەرامبەر 11 جمادى الاخر/1272بۆ یەکسانی و هاوولاتی مسیحی ویەهودی وموسولمان وکەمایەتی تر بۆ سەدری ئەعزەم نێردراوە ،دەقەکەی:(كما أن مساواة الخراج تستوجب مساواة سائر التكاليف والمساواة في الحقوق تستدعى المساواة في الوظائف، فالمسيحيون وسائر التبعة غير المسلمة يسحبون نمرة قرعة مثل المسلمين، ويجبرون على الانقياد للقرار الصادر أخيرًا، وتجري عليهم أحكام المعافاة من الخدمة العسكرية بتقديم البدل الشخصي أو النقدي)،لە سالی 1864 یاسایەکی تایبەتیش بۆ یەهودی بەناوی (نیزام حاخامخانه)دەرچوو بۆ هەردوو

---

[947] المعرفة والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوي، المحقق: د أكرم ضياء العُمَري ج2 ص63

[948] ابن تيمية-اقتضاء الصراطالمستقيم ج1ص419

[949] منهاج سنه النبويه ج4 ص276

ئەنجومەنی (روحانی وجسمانی)یەهودی تیایدا لە مادەکانی (3 و7) دیاری کرا کە شوینی حاخام لە ئەستەمبۆلی پایتەخت دەبێت [950]، لە مەشروتیەی عوسمانی(دەستور) دیسان ئەو یەکسانیە لە بابی( في حقوق تبعة الدولة العثمانية العمومية)لەمادەی (8)ەوە تا مادەی(26) دەگرێتەوە .

سەربردەی (جارنامەی مافی مرۆڤ):

ڕیشەی مافی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەی تێڕوانینێکی چەوت بەرامبەر هەندێ مرۆڤ وکۆمەلگەو نەژاد،گوایە ئەوانە تەواو نین ،نیوە مرۆڤن،ناقسن ، ڕایەکی بلاو هەبوو لەکۆنەوە گوایە (پیاوی ئاینی وقەشەکان)دەبێت لەنەوەی سام بن ،سوارچاکەکانیش لەنەوەی یافپ،هەژاریش لەنەوەی حام کەناتەواو زیادەن..(گوایە لەبنەچەدا لەعنەت لە حام کراوە )دەلێن ئەوە کۆنترین دابەشی ڕەگەزپەرستیە لەسەر بنچینەی ئاینی ،دوای زیاتر ئەو نوقستانیە ڕووی لە ئافرەت کرد، لە (رساله السیاسه )ی ئەرستۆ وتەورات و ئینجیل و باسی نوقستانی هەیە ، بەو هۆیانە فەیلەسوف و قەشەی بەناو بانگ تومائەکوینی دەلێ ئافرەت نوقستان وپەراوێزی دروست کراوە ،شۆبنهاوەریش لە کتێبی (کلمات عن المرأه) دەلێ خۆ عەقلی ئافرەت بە قەد عەقلی پیاو نیە ئیتر بۆ ئەو زولمە لە پیاو دەکرێ وبەئەندازەی پیاو مافی هەبێ ، لە بەشێك لە زانایانی ئیسلامیش ئافرەت بە (ناقصات العقل )هەژمار دەکا ، زۆربەی سەردەمەکان ئەو تێڕوانینە بۆ ئافرەت هەبوە بەتایبەتی لە ئەوروپا ،جاروایە هەندێ جۆرە مرۆڤ بە (ناقص)هەژمارکراوە ،وەك لە تیڕوانینی کۆمەلگەی یۆنانی کۆن لە کۆی 300000 هاوولاتی لە ئەسیناو دەوروبەری تەنها30000کەس مافی بەشداری بڕیاڕو هاوولاتی بوونی ڕاستەقینەبوە، ئەوانی تر بە کۆیلەو مرۆڤی ناقس هەژمارکراون ،بریتی بووینە لە(کۆیلەو بیانی وئافرەت )[951]، هەروەهالەناو هەندێ بۆچوونی عەشایەری و ئیتر تیۆری (فەزل)هاتۆتە کایەوە دژ بەیەکسانی ،زۆربەی میلەتان خۆیان پێ سەرووتر بوە لە میلەتانی تر ..،لەقورئان ئەوە ساغ بوویتەوە

---

[950] سعد سلوم – السیاسات والاثنیات فی العراق (منذ الحکم العثمانی حتی الوقت الراهن) ص20-

[951] قانون الشعوب ص88 .

که خودا مرۆڤی به (ناقص)دروست نه‌کردوه (لقد خلقنا الانسان في احسن تقويم ) له‌وه‌وه نابیت مرۆڤ ناقس بیت چ ژن چ پیاو وه‌ك پاگنده‌ی ئه‌وه بۆهه‌ردوولا کراوه .

له‌سه‌رده‌می نویش دوای جه‌نگ وکوشتارو وێرانکاریه‌کی دڕندانه‌ی زۆر له مێژوو، تا ڕاده‌ی (میژوو بریتیه له تاوانی مرۆڤ به‌رامبه‌ر مافی مرۆڤ-ڤۆلتیر) ،دوای جه‌نگی جیهانی دووه‌م که نزیکه‌ی(17)ملیۆن قوربانی و کۆکوژی ودیل کوژی و سووتاندنی مرۆڤ و کردنیان به سابوون و جینۆساید وکیمیایی و ناوه‌کی ..شاری مه‌زن به ته‌واوی وێرانکراوه... هه‌موو جۆره بێویژدانیه‌ك کراوه،هه‌موو ئه‌وانه‌ش له ده‌زگاو ئه‌نجوومه‌نه مه‌ده‌نی و دیموکراسیه‌کان و چوارچێوه‌ی ده‌ستورو مه‌بده‌ئی بنچینه‌ی رۆژئاواو جیهانی نویٚ (به‌رژه‌وه‌ندی)بڕیاره‌کانی بۆ ده‌رچوه‌و ، له کانگای یاساو سیسته‌می جیهانی ئه‌و بواره‌ی تێدایه که مافی مرۆڤ به‌و شێوه دڕندانه‌یه ببه‌زێندرێت ... ،ئیتر له سه‌ده‌ی بیسته‌میش به‌دواوه زۆربه‌ی جیهان له‌سه‌ر (3)رێباز بوونه رۆژئاوا یان رۆژهه‌ڵات یان بیٚ لایه‌نی جیهانی سێه‌م .... هه‌ڵبه‌ته رۆژهه‌لاتیش هه‌ر به‌ژدار بوون له‌و تاوانانه ئینجا سه‌رباری ئه‌وه‌ش ئه‌و ده‌رده‌یان داوه‌ته میلله‌تانی خۆیان و زیاتریش دیکتاتۆریه‌ته‌که‌یان , هه‌رچی جیهانی سێه‌میشه به جیهانی موسڵمانان نیشینیشه‌وه وه‌ك له رێساکه هاتووه خراپه‌ی هه‌ردوو جیهانه‌که‌ی کۆکردۆته‌وه له‌گه‌ل خراپه‌کاری میژووی خۆشی ، ئه‌وه‌ی هه‌موو ئه‌وانه کۆده‌کاته‌وه په‌یره‌وی ده‌ستووری علمانیه‌ت کردنه، ئه‌وه سه‌رده‌می ئاینی وسیۆکراتی نه‌بوه ، ... واته له ناوه‌رۆکدا یه‌ك سیسته‌م بووه ، بۆیه ئه‌و جیهانه بریتی بووه له‌جیهان و یاسای دارستان و دۆزه‌خی بیٚ ده‌سه‌ڵاتان بووه, گه‌وره بچووکی قووت داوه, به‌هێز پشتی بیٚ هێزی شکاندووه ،مێژوو ئاوا هاتوه وای له ڤۆلتیر کرد بلیٚ : مێژوو بریتیه‌له تۆمارگای تاوانه‌کان ، ئینجا له دوای نیشتنه‌وه‌ی ته‌پ وتۆزی هه‌مو ئه‌وانه‌و سه‌رکه‌وتنی رۆژئاوا بینای ئه‌و مافانه کراوه ،یه‌کیٚ له‌وانه مافی مرۆڤه .له‌لایه‌ن کۆمه‌ڵێك زاناو فه‌یله‌سوف و مافناس ، ئیتر له ساڵی 1948 پالپشت به ماده‌ی 68ی میساقی نه‌ته‌وه یه‌کگرتوه‌کان[952] لیژنه‌یه‌کی کاتی

---

[952] ده‌قی ماده‌که: المادة 68(ينشئ المجلس الاقتصادي والاجتماعي لجاناً للشؤون الاقتصادية والاجتماعية ولتعزيز حقوق الإنسان، كما ينشئ غير ذلك من اللجان التي قد يحتاج إليها لتأدية وظائفه.

مافی مرۆڤ پیکهات له(16فیبرایری 1946) بۆ تاوتویی پرۆژەیەکی ماف ،لەسەرەتای 1947 گەیشتنە شیوەیەك ولیژنەیەکی ترلە وولاتانی جیاجیا پیکهات لە 9 مەندوب:

1 – ئیانور روزفلت سەرۆکی لیژنە -ئەمریکا . 2 – شارل مالك لبنان . 3 – رینیە کاسان فرنسا . 4 – بنج شونج تشانج الصین . 5 – جون ب . هنفری کندا . 6 – هیرنان سانتا کروز تشیلی. 7 – ئیلکس بافلون یەکیتی سوفیت. 8 – جوفری ویلسون بریگانیا .

9 – ویلیم هود جیسون إستراليا .

لەبەر ئەوەی ئەو لیژنەیە لە ئارستەو ئایدیۆلۆجیای جیاجیای مارکسی وسەرمایەداری وئاینی پیکهاتبوو زۆر بە زەحمەت گەیشتنە فۆرمیك کە سەرجەم 85 کۆبونەوە کرا،تالە 10دیسمبری 1948 لەپاریس جارِدرارەزامەندی کۆمەلەی گشتی (نەتەوەیەکگرتوەکان)بلاوکرایەوە،درادەنگدانو 48 وولات دەنگی دا،دوان ئامادەنەبوو 8 وولات دژ وەستان، لەوانە سعودیە بە هۆی مادەی 18 رەتی کردەوە .

ئەو جارِنامەیە پیکهاتوە لە 32مادە ،بە زمانی ئینگلیزی وفرنسی وئیسپانی بلاو کرایەوە ، بە پێی برِیارِی ( الجمعیه العامه رقم: 217 (د-3) المؤرخ 10 کانون الاول/دیسمبر 1948 – الشرعه الدولیه لحقوق الإنسان) ،دوای لە برِیارِیکی تری ژ:423 خولی(5)رۆژی مافی مرۆڤ دیاری کرا_ ، دوای لیژنەیەك لە سالی 1966پیکهات لە18شارەزا لە نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ چاودیری ،دوای لە 2006/6/61 ئەنجومەنی دەولی بۆ مافی مرۆڤ جیگەی گرتەوە بە پیی برِیارِی ( المجلس الاقتصادی والاجتماعی)خولی(1)ی16فبرایر1946 ,ئەوەیخوارەوەدەقیجارِنامەکەیە:

خالی - ١ هەموو مروڤێك بە ئازادی لەدایك دەبێ و کەرامەت و مافی یەکسانیان هەیە ، هەموویان خاوەنی ئەقلّ و ویژدانن و دەبی لەگەلّ یەکدا هەلّسوکەوتی برایانەیان هەبێ.

خالی – ٢ ئەم ئازادی و مافانەی کە لە جارِنامەکەدا ئاماژەیان پێکراوە هەموو مرۆڤێك بە شێوەی یەکسان و بە بێ هیچ چەشنە جیاوازییەك دەگرێتەوە واتە نیژاد ، رەنگ ، رەگەز ، زمان ، ئائین ، بیرورِای رامیاری و یان هەر باوەریکی دیکە ی، هەروها رەچەلّەك، بارودۆخی کومەلاتی ، سەروەت وە سامان ، لە دایك بون و هەر شیواز یا بارودوخیکی دیکە . هەروەها هیچ هەلّاواردنێك لە سەر بنمای رامیاری ، ئیداری یان نێودەولّەتیی ولّاتێك یان نیشتیمانێك هەبێ کە کەس هاولّاتیی ئەو

شوێنه بێ. جا ئەم ولاتە یان ناوچەیە سەربەخو بیت ، یان داگیرکراو یان دەسەڵاتێکی سنورداری هەبێت.

خالی - ٣هەموو کەس مافی هەیە ژیان و ئازادی و ئاسایشیی شەخسی هەبێ.

خالی – ٤ هیچ کەسیك ناتوانێ کەسێك بەکویلە بهێلێتەوە و کڕین و فرۆشتنی کۆیلە بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیە.

خالی – ٥ هیچ کەسیك نابی ئەشکەنجە بکریت یان بە شێوەی زاڵمانە سزا بدرێت یان رووبەڕووی هەڵسوکەوتی دژە مرۆڤی بێتەوە یان بچەوسێندرێتەوە.

خالی - ٦ هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە کە کەسایەتی حقوقی خوی لە هەمو شوینیك وەکو مرۆڤ بە فەرمی بناسرێت.

خالی – ٧ هەمو کەسیك لە بەرامبەر یاسادا یەکسانن و مافیان هەیە بە بی هیچ جیاوازی و هەلاواردنیك یاسا پشتیوانیان لێ بکا ،هەمو مافی هەیە لە بەرامبەر هەر چەشنە هەلاواردن یان جیاوازیەك کە دژ بەم جارنامەیە بیت و دژ بە هەرچەشنە هاندانێك کە هەلاواردنێکی لەم شێوەیە بەدیبێنێ ، لە یاسا سود وەربگرێت.

خالی – ٨ لە بەرامبەر هەر کردەوەیەك کە مافە بنەڕەتییەکانی تاك پێشێل بکا – و ئەو مافانە بە هۆی یاسای بنچینەیی یان یاسایەکی دیکە بۆ تاك ناسرا بێت، مافی ئەوەی هەیە لە دادگای باڵای نەتەوەیی پێداچوونەوەی بۆ بکرێ.

خالی – ٩ هیچ کەس نابی سەرەرویانە دەستبەسەر، زیندانی یان شاربەدەر بکریت.

خالی – ١٠ هەموو کەسیك بە بێ جیاوازی مافی ئەوەی هەیە کە سکاڵای خوی لە دادگایەکی سەربەخۆ و بی لایەن ، بە ئاشکرا کارەکانی بو بەریوە ببەن. دادگایەکی ئاوا لەبارەی ماف و ئەرکەکان یان هەر تۆمەتێکی کە خرابێتە پاڵی ،دەبی بریاری لەسەر بدات.

خالی – ١١ ١ ) هەر کەسیك تاوانی خرابێتەپاڵ ، هەتا ئەوکاتە بێتاوانە کە لە دادگایەکی گشتیدا کە هەموو گەرەنتییەك بۆ بەرگریکردنی بۆ دابین دەکرێ و تاوانباربونی بە شیوەی یاسایی پشتراست دەبێتەوە.

٢ ) هیچ کەس بۆ ئەنجامدان یان ئەنجامنەدانی کردەوەیەك لە کاتی روودانی کردەوەکە ، بە پێی مافی نەتەوەیی یان نێودەوڵەتی بە تاوان دانەنراوە تاوانبار لەقەڵەم نادرێ، بەم هۆیە هیچ سزایەك لەوە قورستر کە لە کاتی روودانی تاوانەکە دەسەپێندرێت رووبەرووی کەس نابێتەوە.

خالی – ١٢ هیچ کەس نابێ لە ژیانی تایبەتی ، کارو باری کومەلایەتی ، شوینی ژیان وپیوەندیەکانیدا سەرەرۆیانە لێپرسینەوەی لێبکرێت و هێرش بکرێتە سەر شەرەفەت و کەسایەتی و ناوو ناوبانگی ، هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە کە لە بەرامبەر ئەمچەشنە لێپرسینەوە و هێرشکردنانەدا یاسا پشتیوانی لێبکا.

خالی - ١٣ ١ ) هەموو کەسیك مافی ئەوەی هەیە لە هەموو ولاتیکدا بە ئازادانە هاتوچو بکات و شوینی ژیانی خۆی هەڵبژێرێت.

٢ ) هەمووکەسیك مافی ئەوەی هەیە هەر ولاتیك ، یەك لەوان ولاتی خوی بەجی بیلێت یان بگەریتەوە بو ولاتی خوی.

خالی - ١٤ ١ ) هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە کە لەبەرامبەر راوەدوونان، ئەشکەنجە و ئازار، پەنایەك بدۆزێتەوە و لە وڵاتانی دیکە ببێتە پەنابەر.

٢ ) ئەگەر راوەدوونان بەهۆی تاوانی گشتی و نا سیاسی ورەفتاری دژ بە بنەما و مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بێ ، ناتوانریت سوود لەم مافە وەربگیرێت.

خالی - ١٥ هەر کەس مافی تایبەتی هاولاتی بونی هەیە،

هیچ کەسیك نابیت سەرە رویانە لە هاولاتی بونی خوی، یان لە گورینی مافی هاولاتی بون بی بەش بکریت ،

خالی - ١٦ ١ ) هەموو ژن و پیاوێکی پێگەیشتوو مافیان هەیە بە بی هیچ سنورێك لە رووی نیژاد ، نەتەوە ، یان ئایینەوە پیکەوە ژیانی هاوبەشی پیك بینن. و لە کاتی جیابوونەوەشیان ژن و میرد لە هەموو کاروبارەکانی پەیوەندیدار بە زەواج مافی هاو یەکسانیان هەیە .

٢ ) پێکەوەنانی ژیانی هاوبەشی دەبی لە سەر رزامەندی و ئازادی تەواوی ژن و پیاو بیت .

٣ ) بنەماڵە کۆڵەکەی سروشتی و بنچینەی کومەلگایە و دەبی مافی ئەوەی هەبێ سود لە پشتیوانیی کومەلگا و دەولەت وەربگرێ.

خالی - ١٧ ١ ) هەموو کەسیك بە تەنیا، یان بە هاوبەشیی مافی بەخاونبوون هەیە.
٢ ) هیچ کەس نابیٚ سەرەڕویانە لە مافی خاوەندرایی بی بەش بکریت.
، خالی - ١٨ هەموو کەسیك مافی هەیە بە ئازادی سود لە بیرو ویژدان و ئایین وەرگریت. ئەم مافە گورینی ئازادانەی دین یان بیر و بڕوا وەخۆدەگرێت. هەروەها پەروەردەی ئایینی و بەریوەبردنی مەراسیمی ئایینی دەگرێتەوە. هەموو کەسێك بەتەنیا یان بە کۆمەڵ بەشێوەی تایبەتی یان بە هابەشی گشتی دەتوانیٚ ئەو مافەی هەبیٚ.
، خالی - ١٩ هەموو کەسێکمافی هەیە بە ئازادی بیر و رای خۆی دەربڕێت. ئەم مافە ئاماژە بەوە دەکا کە هەموو کەسێك بە بیٚ ترس و دڵەڕاوکیٚ بڕوای تایبەت بە خۆی هەبێت و لە بەدەستهینانی زانیاریی و بیرو را و بڵاوکردنەوەیان بەئازادی دەستی بە ئامرازەکانی پێویست رابگات.

خالی - ٢٠ ١ ) هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە بە ئازادیی کۆڕ و کۆمەڵ و گروپی ئاشتیخواز پێك بهێنێت.
٢ ) کەس ناتوانیٚ کەسێك ناچار بکا لە کۆڕ و کۆبوونەوەدا بەشداری بکا.
، خالی - ٢١ ١ ) هەموو کەسیك مافی ئەوەی هەیە کە لە کارو باری بەریوە بەرایەتی گشتی ولاتی خۆی ، بەشیوەی راستەو خو یان لە ریٚگەی هەلبژاردەنی نوینەرانێك کە ئازادانە هەلبژێردراون بەشداری بکات.
٢ ) هەموو کەسیك مافی هەیە بە یەکسانیی هەلومەرجەکان، کاروباری گشتیی وڵاتی هەبیٚ.
٣ ) ئیرادەی گەڵ ،بنچینە و سەرچاوەی دەسەلاتی حکومەتە. ئەم ئیرادەیە دەبی بە شێوەی هەلبژاردن بیتە ئاراوە کە کە بە پێی راستگۆیی و بەشیوەی دەورەئی پیك بیت.هەلبژاردن دەبی گشتی و بە تەبایی بێت وبە دەنگی نەهینی یان هاوشیوەکانی بەریوە بچیت کە ئازادی دەنگدانی تیدا مسۆگەر بووبێت.
خالی – ٢٢ هەموو کەسیك وەکو ئەندامی کومەلگا مافی ئاسایشی کومەلایەتی هەیە و ریگەی پیدراوە بە پشتیوانی گشتی و هاوکاری نیودەولەتی ، مافی ئابوری ، کومەلایەتی کولتووریی خۆی بە

وەبەرچاوگرتنی پێکهاتە و سەرچاوەکانی هەر وڵاتێك کە پیویستیی پلە و پێگەیشتنیی ئازادانەی کەسایەتیی ئەوە بەدەست بێنێ.

خالی - ٢٣ ١ ) هەموو کەسیك مافی کار کردنی هەیە، بە ئازادی کاری خۆی دەستنیشان بکا ، هەلومەرجی بەدوور لە غەدر و ئەرخەیان بەخش بۆخۆی بخوازێ و لە کاتی بێکاربوونیدا پشتیوانیان لێبکرێت.

٢ ) هەمو کەس مافی ئەوەی هەیە کە بەبی هیچ جیاوازیەك ، لە بەرامبەر کارکردنی یەکساندا ، موچەی یەکسان وربگرێت.

٣ ) هەر کەسێك کە کار دەکات موچە و حەقدەستی گونجاو و ئەرخەیانبەخش وەر بگریت کە ژیانی خۆی و بنەمالەکەی لە ئاستی ئینسانیدا بەڕێوە ببات و لە کاتی پیویستدا بە یارمەتی کەرەستەکانی پشتیوانیی کۆمەڵایەتی، باشتری بکا.

٤ ) هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لەگەل کەسانی دیکەدا یەکێتی دروست بکات و بەشداری یەکێتییەکان بێت.

خالی — ٢٤ هەموو کەسیك مافی حەسانەوە و پشوو و سەیرانی هەیە و بە تایبەت دەبی لە سنوردار بوونی گونجاوی سەعاتی کار و مەرەخەسی و پشووەکان بەشێوەی دەورەیی موچەی پێبدرێ.

، خالی- ٢٥ ١ ) هەموو کەسیك مافی ئەوەی هەیە کە ژیانیکی گونجاوی بو دابین کردنی سلامەتی و خۆشگوزەرانی و خۆی و بنەماڵەکەی هەبێ، بە تایبەتی لە رووی خواردەمەنی ، جلو بەرگ ، خانو ، چاودیری پزیشکی و خزمەت گوزاریەکانی تایبەتی کومەلگاوە. هەروەها مافی هەیە کە لە کاتی بی کاری ، نەخوشی ، کەم ئەندامبوون ، بیوە ( ژن یان پیاو ) ، پەکەوتە یان لە تەواوی بوارەکانی دیکەی ژیان کە بەهوکاری بەدەر لە تواناى خۆی نەتوانێ بژیوی خۆی دابین بکا لە بیمەی کۆمەڵەیەتی سود وەربگرێ.

٢ ) دایکان و مندالان مافیان هەیە کە لە یارمەتی و چاوەدێریی تایبەت سوود وەربگرن. هەموو مندالان ، چ ئەوانەی سەمەرەی زەواج بن یان بەبی زەواج دینە دونیا ، مافیان هەیە لە پشتیوانی کۆمەڵاتیی یەکسان سود وەر بگرن.

خالی - ٢٦ ١ ) ههموو کەسیك مافی هەیە لە دامو دەزگای پەروەردە سود وەر بگریت. خویندن و پەروەردە ، لانی کەم خویندنی سەرەتایی و خویندنی و سەرەتاییدەبێ خۆڕایی بێت. خویندنی سەرەتایی ئەرکی سەرەکیە، پەروەردەی تکنیکی وە پیشەیی دەبی ببیتە گشتی ، بەدەستهینانی خویندنی بالا دەبی بە یەکسانیەکی تەواو بو هەمو کەس دابین بکریت هەتا هەر کەسیك بتوانیت بە پی توانای خۆی سودی لێوەر بگریت.

٢ ) ئامانجی خویندن و پەروەردە دەبی گەشەکردنی هەمولایەنی  کە سایەتی مروڤ و باشتر وەبەرچاوگرتنی مافی مروڤ و ئازادییە بنچینەییەکان بیت . خویندن و پەروەردە دەبی بو پەرەپیدانی لیك تیگەشتن و یەکتر قەبول کردن و دوستایەتی لە نیوان تەواوی نەتەوەکان وە گروپە نیژادی یان ئایینیەکان یارمەتیدەر بێت و هەر وە ها پەرە بدات بە چالاکییە نێودەوڵەتییەکان بۆ پارستنی ئاشتی.

٣ ) باوك و دایك لە دەست نیشان کردنی چونیەتی خویندن وە پەروەردە بو مندالانی خویان لە هەموو کەس لەپێشترن.

خالی - ٢٧ ١ ) هەمووکەسیك مافی هەیە ئازادانە لە ژیانی کولتووری وکومەلایەتی بەشی هەبیت بەشدار بێت و لە هونەرەکان و بە تایبەت لە پێشکەوتنی زانستی و قازانجەکانی سوود ببینێت.

٢ ) هەموو کەسیك مافی هەیە لە بەرژەوەندییە مەعنەوی و مادیی بەرهەمە زانستی و ئەدەبی یان هونەرییەکانی خۆی سود وەربگرێت.

خالی - ٢٨ هەموو کەسیك مافی ئەوەی هەیە خوازیاری پیکهینانی نەزمو نیزامیك لە بۆواری کۆمەڵایەتی و لە ئاستی نیو دەولەتی دا بیت کە ماف و ئازادیەکانی ناو براو لەم جارنامەیە بە تەواوی دابین و بەکردەوە جی بەجی بکات.

خالی - ٢٩ ١ ) هەرتاکیك تەنیا لە بەرامبەر ئەو کومەلگایە ئەرکی لە ئەستو دایە کە گەشە سندنی ئازادانە و هەمەلایەنەی بو دەستەبەربکات ،

٢ ) هەر کەس لە بەکارهێنانی ماف وسود وەرگرتن لەو ئازادیانەی خوی کە تەنیا گوی رایەلی ئەو سنورە یاساییانەیە

که تەنیا بۆ ناسین و وەبەرچاوگرتنی ماف و ئازادییەکانی خەڵك و بۆ وەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی عادیلانەی ئەخلاقی و شیرازەی گشتی و خۆشگوزەرانیی هەمووان لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیکدا دیاری کرابن.

٣ ) ئەم ماف و ئازادیانە لە هیچ بواریك دا نابی بە دژی ئامانج و بنەماکانی نەتەوە یەك گرتوکان بەکار بهێندرێن.

خالی - ٣٠ هیچکام لەم خاڵانەی جارنامەی بەر دەست نابیت وا لیك بدریتەوە کە ببێتە مافێك بۆ دەوڵەت یان گروپ یان تاکێك هەتا بتوانێ ماف و ئازادییەکانی ئاماژەپێکراو لەم جاڕنامەیەدا پێشێل بکات یان کارێکی لەم شێوەیە ئەنجام بدات[953].

ڕەهەندی ئاینی لەو جاڕنامەیە

ئەو جاڕنامەیە وەرچەرخانیکی زۆر گرنگ بوو لە ڕێزی مرۆڤایەتی،کاری فکری وسیاسی و یاسایو زۆری بۆکراوە ، لە بارەی ڕیشەو سەربردەی جگە لەوەی ئەوە هەمو مافەکانی مرۆڤ نیە کە لەخواروو باس دەکریت ،لایەنیکی تری هەیە پیویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە ، وا پیشان دراوە ئەوە لە ئەنجامی چالاکی مرۆڤایەتی هاتبێت دژ بە تیگەیشتنی ئاینی ،بۆیەش لە باس کردنی ڕیشەو سەرچاوەکانی ئاماژە بەدەقی ئاینی نەکراوە ،کەچی ئەوەی خوارەوە دەری دەخا کە زۆربەی مادەکانی مافی مرۆڤ سەرچاوەی ئاینی هەیە ،لە هەمویان زیاتر وزەق تر مادەی یەکە ،لەبەر گرنگیشی لە ریزی هەرە پیشەوە دانراوە ،المادە 1: (یولد جمیع الناس أحراراً متساوین في الکرامة والحقوق، وقد وهبوا عقلاً وضمیراً وعلیهم أن یعامل بعضهم بعضاً بروح الإخاء) ،ئەوە لە مادەی (1) ی (إعلان حقوق الإنسان والمواطن –1789)فرنسا وەرگیراوە، دەقەکەی : المادة الأولی (یولد الناس ویعیشون أحراراً متساوین قي الحقوق. ولا یمتاز بعضهم عن بعض إلا فیما یختص بالمصلحة العمومیة أي أن نفع الجمهور هو قاعدة الامتیاز) ،ئەوەش ئەسلەکەی بۆ عمر کوری خەتاب دەگەڕێتەوە(متی استعبدتم وقد ولدتهم احرارا) سەربردەو بۆنەی ئەو ئاخافتنەی ئیمامی عمر زۆر ڕوونە ، مادەی 2.ی

---

[953] omar_enayati@hotmail.com

جارنامەکە بۆ (يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير)هەروەها فەرمودەی (لا فرق بين عربي و لا أعجمي و لا أبيض ولا أسود إلا بالتقوى.)دەگەڕێتەوە، ،بۆمادەی 3 ی جارنامەکە (وامنهم من الخوف)، بۆ مادەی 4(ويوصينا بولس الرسول برفضها في قوله "قد اشتريتم بثمن فلا تصيروا عبيدًا للناس" (1كو7: 23) ، بۆمادەی 5 و6(قال المسيح له المجد "إن حرركم الابن فبالحقيقة تكونون أحرارًا" (يو8: 36). ( ولم نُستعبد لأحد قط، كيف تقول أنت إنكم تصيرون أحرارًا؟" (يو8:32-33). فكيف يقول اليهود هنا أنهم لم يكونوا عبيدًا قط؟!) ، بۆ مادەی7 و8 و9(سواسية كأسنان المشط) ، (تعريف وطن بۆ مادەی 13 و14) ، بۆ مادەی 16(الزواج نصف الايمان) ، (لااكراه فى الدين.. مادەی 18 و19)... وزۆربەی مادەکانی تر لە ژێر سایەی (وكرمنا بنى ادم) هەروەها وەلامی ئینجیلیش: ما موقف ربنا يسوع من العبودية؟ جواب: جاء السيد المسيح بتعاليم جديدة صادمة للمجتمع وقتها، إذ طلب من الناس محبة الجميع حتى الأعداء، وساوى بين كل البشر: السيد والعبد، الغني والفقير، الرجل والمرأة. "من أراد أن يكون فيكم أولًا فليكن لكم عبدًا" (مت 20: 27(، "ليس يهودي ولا يوناني، ليس عبد ولا حر، ليس ذكر وأنثى" (غل 3: 28).. اتبع التلاميذ والرسل والمسيحيون الأوائل خطوات وتعاليم السيد المسيح "الأملاك والمقتنيات كانوا يبيعونها ويقسمونها بين الجميع كما يكون لكل واحد احتياج" (أع 2: 45)، بەو شێوەیە ئەگەر بەووردی پێدا بچین مادەبەمادە زۆربەی ڕەهەندی ئاینی هەیە، تەنانەت زاراوەکەش (مافی مرۆڤ) بەدەق لە تەورات هاتوە (وَلاَ يَكْتَفُونَ بِأَنْ لاَ يَشْكُرُوا عَلَى الإِنْعَامِ وَأَنْ يُنَابِذُوا الْحُقُوقَ الإِنْسَانِيَّةَ،...)،زیاتر لەوەش بەشێك لە خۆشەویستانی ئیمامی علی دەلێن مافی مرۆڤ بەدەق و ڕاستەوخۆ لەلایەن ئیمامی علی هاتوە ، بە پیی کتیبی (حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب) یەکەم جار چەمکی مافی مرۆڤ وئازادی وڕادەربڕین لای ئیمامی علی بەرجەستە بوە لە چوارچێوەی ئاینی ئیسلام (دعا الامام علي (ع) إلى أن ينعم الانسان بحق المساواة العادلة في ابعاده كافة سواء البعد الإنساني ، او الأجتماعي ، او الاقتصادي ، او السياسي ، او القضائي)[954]،هەتا بوونی معارەزەی سیاسیش.

---

[954] حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب ص 472ص474 ص201

سەرەڕای ئەو ڕاستیانەش لە موسوعەی بریتانی (Encyclopædia Britannica) دەڵێ ئەو جاڕنامەیە لەزۆر ڕووەوە نوێ بوو دەلیت جاڕنامەی پیشوو تر هەبوە بەلام نیوەی مرۆڤی دەگرتەوە باسی مافی ئافرەتی تێدا نەبوو[955] ،ڕاستیەکەی بۆ هەمووی وانیە ،ڕاستە لە جاڕنامەکەی فرنسی( إعلان حقوق الإنسان والمواطن –1789) ناوی ئافرەتی تیا نەهاتوە بەلام (5)جار ناوی پیاوی تیا هاتوە لەمادەکانی 6 و7 و9، کەچی لەو ناوەرۆکانەی کتاب المقدس و قورئان (کە لەسەروو تۆمارکراون) بە ئاشکرا مافی ئافرەتیشی تیدایە ، بەناوهینانیشیانەوە .

ئەو ئەسلانە هەر لەیەك کتیبی ئاسمانیە بەلکو لەزۆربەی هەیە بەلام کورتمان کردەوە لە ئاینی ئیسلام ومسیحی ویەهودی .

<u>کاردانەوەو هەلسەنگاندنی جاڕنامە:</u> لەدوای جاردانی مافی مرۆڤ زیاترین دەنگی دایەوە لە جیهان ،تا ئیستاش بینگ بانگی لە فراوان بووندایە، ئاستەکانی سیاسی ویاسایی ودەستوری گرتۆتەوە ،کەوتۆتە نێو پرۆگرامی ریکخراوو حزب ودەستورەکان ،هەر لەنەتەوە یەکگرتوەکان هەردوو عهدی دەولی (مادەی9،6،3 ی عهدی مەدەنی وسیاسی) و(مادەی5،3،2ی عهدی ئابووری وکۆمەلایەتی ،دیباجەی زۆربەی بڕیارو ریکەوتنە نیودەولەتیەکان داکۆکی لەو مافە دەکاتەوە ،بەمافی چارەنوس بەندکراوە،جگەلەوولاتانیپیشکەوتوگەیشتۆتەدەستوریوولاتانیعربیش،مادەی(20)دەستوری سودان،مادەی24ی دەستوری جزائر،مادەی13بحرین،10جیبۆتی، 16سۆمال، 41 میسر،7 ئوردەن،8لبنان،13 مۆریتانیا ،11 فلستین،26قەتەر،36 سعودیە،25 سوریا،26 ئیمارات،48 یەمەن،..[956] ئەو ڕایە لە جیهانی سێیەمە وە گەیشتە کوردستانیش، لە راپۆرتی سیاسی (ی.ن.ك) کۆنگرەی (2) زیاتر لەهەموان هاتووە: (پەرەسەندنی بیر و داخوازی مافی مرۆڤ و دیمکراسی کە

---

[955] Encyclopædia Britannica- Article: human rights

[956] بۆ زیاتر لە بارەی هەلویستی دەستوری وولاتانی عربی لەبارەی چەمکەکانی هاوتای مافی مرۆڤ بڕوانە: الديمقراگيە والحريات العامە –المعهد الدولی لقانون حقوق الانسان –جامعە دیپۆل ص196–

هەردووكیان هەم بۆ گەشەكردنی سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد پێویست بوون، بۆ ڕیسواكردنی رژێمە دیكتاتۆریەكان..)[957].

لەگەل ئەو پیشكەوتنەشیدا رەخنەو هەلسەنگاندنی پیچەوانەش هەبوە ،هەر لە چوارچێوەی گفت وگۆ لەبارەی داڕشتنی ئەو جاڕنامەیە بۆچوونی جیاجیای لێدەركەوت ، هەردوو كوتلەی رۆژهەلاتی بە سەرۆكایەتی سۆڤیەت وجهانی سێیەم پێی رازی بوون بەلام كەمتر ڕەچاوی ئەو مافانەیان كردوە ،بۆیە سالانە ناوی ئەوانە لەپیشەوەی ناوی ئەو دەولەتانە بوە كە پیشیلی ئەو مافانەیان كردوە ، سۆڤیەت وباقی حزبە شیوعیەكان دەگەڕانەوە سەر بۆچونەكانی ماركس و ئەنجلس ولینین لە بارەی مافی مرۆڤی پیش جاڕنامەكە، هەرچی هەندێ وولاتی ئیسلامیش لەوانە (سعودیە) هەولی دەدا بلێ دژایەتی هەیە لەگەل شریعەتی ئیسلامی ولە دەنگدانی نەتەوە یەكگرتوەكانیش بۆ ئەو جاڕنامەیە ناڕازی بووبەتایبەتی مادەی (18)، لە پیش هەموان ماركس رەخنەی لە جارنامەكەی فرنسای سالی 1791 و تاوتوێیەكانی تری ئەو مافە هەبوە ،پێی وابوو ئەوە مافی مرۆڤی برجوازیە،مانای خۆویستی مرۆڤە ،بەرامبەر ململانێیان لەگەل چینی دەرەبەگ، دەلی دەبوایە لە(إعلان حقوق الإنسان لعام 1791) وابنوسرابایە:( تتمثل الحرية في الحق في فعل كل ما لا يضر الآخرين- ماركس:فی مسألة اليهودية) ،دەشلێ ئەو جاڕنامەو مافە پەیوەندی مرۆڤەكان پتەو ناكا بەلكو دوریان دەخاتەوە ، ماركس دەلێ مافی ڕاستەقینەی مرۆڤ مافیەتی لە مولكیەت ،نمونە بە مادەی 16ی دەستوری 1793ی فرنسا دەهینیتەوە ( الماده 16- دستور 1793): (حق الملكية هو حق كل مواطن أن يتمتع كما يريد بمتلكاته، ومدخولاته وبثمار عمله واجتهاده ويتصرف بها) دەلێ كەواتە ئەوە مافەكەیەتی چۆنی بوێ هەلس وكەوت بەمولكیەتی بكا[958]،لەلایەكی تریش رەخنە لەدەبل ستاندەری وكەمی جیبە جێكردنی دەگرێت بەتایبەتی لەسەردەمی جەنگی سارد ، هەندی وولاتی ئیسلامی هەلوەستەی لەسەر مادە جۆربەجۆرەكانی ئەو جاڕنامەیە هەیە لەبارەی نەگونجانی لەگەل شریعەتی

---

[957] راپۆرتی گشتی (ی.ن.ك) كۆنگرەی (2) ل2.
[958] ماركس– فی مسألة اليهودية ص 17 وص19 .

ئیسلامی ،بۆیە زۆرجۆرە میساقی تری مافی مرۆڤ لە جیهان هاتوە ، میساقی جامعەی عربی ،میساقی کەنداو ،میساقی کۆنگرەی ئیسلامی ،مبساقی یەکیتی ئەفریقی ...

بەڵام لەدوای ئەو جاڕنامەیەش تا ئەو ساتەش ئەو یاسایانەی دارستان هەر بەردەوامەو میللەتانی ژێردەستەو گەلانی بچووك و کەمایەتی و هەتا وولاتانی بیٚ هێزیش بە زنجیرە دەچەوسێتەوە، لەسەروو ڕا هەتا دەگاتە بچووکترین یەکەی کۆمەڵ کە خێزانە، میللەتی کوردیش زۆری هاوار کردووە زۆر بەکەمی بەهانای هاتوون ،لەدوای جەنگی ساردو تاك جەمسەری بەرەو باشتریە ، سەرەرای ئەوەش جارنامەیەکی ئیجابییەو نیشانەی گەشەی ویژدانی کۆمەڵەو جارجارە ریٚگر بوو لەسنوور بەزاندنێکی بیٚ ڕاددە،لە بنەچەشدا ئەگەر مرۆڤ ئەو مافانەی نەبێت ناتوانی پەیامەگەورەکەی خودا(کە بەمرۆڤی سپاردوە) جیبەجێی بکا کە بریتیە لە هینانەدی شارستانی ، لە چاو ئەو هەمو وەسفە بۆ ئەو جاڕنامەیە هەندیٚ کەم وکورتی تریشی تیدایە بەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە :

1-ئەو مافانە بە ڕوانگەو پیویستی مرۆڤی ئەوروپی و مەدرەسەی لیبرال دیموکرات و سیستەمی سەرمایەداری و فلسفەی تاکگرایی داڕژراوە ، جاڕنامەکەمافی تەواوی مرۆڤی پیٚنیە... زۆر نوقستانە مافی مرۆڤ زۆر فراوانترە لەو چەند بەندە ،بەڵام لە چاوپێش تر بە ئیجابی لەقەڵەم دەدریٚت .

2-بەشێکی ئەو بەندانەن کە لە ئەسڵدا مەبادئی ئاینین هەر یەکەم بەندی کە دەڵیٚ (یولد جمیع الناس کاحرارا متساون ..)بیئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوەیە بکا (م. عمر/ متی استعبدتم وقد ولدت احرارا).

3-ئەو بەندانەش خۆبەخۆ ناکۆکن لەگەڵ یەکتر لە چەندین مادە .

4-ئینجا وەك پرسی (یاسای نەفامی)و (بانێك ودووهەوا),(چەند تەرازوو)بەزۆری دەبینین بۆ هەندێك کات بیٚ دەنگیە بۆ ئەوانەی خۆشیان ڕقیان لێە بەکاری دەهێنن، خۆ لە ساڵی 1987-1988 بە کیمایایی لە هەموو کوردستان درا بەو شێوەیە نەهاتنە دەنگ دەبوایە بڕیاڕی 688 ئەو کات دەرچیٚ ،کەچی لەدوای داگیر کردنی کوێت لە ساڵی 1991 ئەو بڕیارانەدەرکران دژ بە عیراق .

5-ئەوەی زۆر ترسناکە ئەوەیە ئەگەر دەسەلاتی رەسمی چەك وبەرگری بەکارهێنا شرعیە، ئەگەر خەلکێکی چەوساوە بۆ بەرگری لە خۆ بیکا ناوناتۆرەی تیرۆرو دژە یاساو نامەدەنی و .... دەدەنە پالّ و (مافی مرۆڤیش)بێ دەنگ دەبێ.

6-تا ئێستا جارنامەی مافی مرۆڤ نەبۆتە هۆی ماف وەرگرتن یان رزگار بوونی گەلێك،یان هینانەدی مافی چارەنوس،هەرچەندە لە زۆر شوێن مافی مرۆڤ ومافی چارەنووس لێکگرێدراوە ، وەکلە( إعلان وبرنامج عمل فيينا الصادر عن المؤتمر الدولي لحقوق الإنسان المعقود)لەشاری ڤیەنا بەسترا لە رۆژانی نێوان 14 - 25 /6 1993 ،کەچی بە هۆی ئەو جارنامەیە مافێکی چارەنوس نەهاتۆتە دی ،مەگەر بەخۆی بەرگری نەکردبێت و هەولّی بۆ نەدابێت.

7-ئەو جارنامەیە بۆ کۆمەلگەیەکی نادادگەریە ئەگینا پێویستی بەو جۆرە جارنامەیە نیە،واتە دەبێ دادگەری لە رێی دەستورو یاساو ئەخلاقی کۆمەلگە ئەو مافە ئۆتۆماتیکی بیتە دی ،بیئەوەی (جارنامەی)بۆ تەرخان بکریت.

8-تا ئێستاش هەموو ئینتمایەکانی تر هەرەمەکی پێ دەدرێ، کەچی ئینتمای سیاسی هەروا ئازاد نیە لەهەموو جیهان، سەربەستی پێنەدراوە بەنیشانەیەکی سادەوساکار دەردەکەوێ بەشی هەرە زۆری خەلکی جیهان بە تایبەتی خەلکی جیهانی سێیەم بەو پرسیارەی تەواو سەغلەت دەبێ کە دەلێ تۆ پیاوێکی سیاسی ؟ کە دەلێ نەخێر ...من کاسبم , من مەدەنیم , من کرێکارم , من ..... هەتا ئەوانەی لەوبوارەئیش دەکەن ئەگەرئاشکرا بن ئینکاری دەکەن ... واتە لەبەر تۆمەتبارنەبوون.

9-باس لە ئازادی ئاینی کراوە بەلام بە راشکاوانە باس لە ئازادی ئاین گۆرین نەکراوە کە مافیکی ئەسلی ئاینیشە ،بۆیە ئەو بانگەوازەی (پاپا) لە سەردانەکەی بۆ هند لە کۆتایی مانگی 1999/11 تا رادەیەك هەقە کە وتی: با بەندێك بۆ (مافی مرۆڤ) زیاد بکرێت کە هەر کەس بتوانی بەسەربەستی ئایینیش بگۆرِی.

**چونکە:** لەو سەردەمەی عەولەمە ئەو چەمکانە :دار الاسلام، ولاتانی ئیسلامی، دار الكفر، دار الحرب، دار الامان، کۆمەلگەی ئیسلامی، ئێمەی ئومەتی محمد، لەژێر دەسەلاتی عەلمانی دا ماناکانی پڕ بەپێستی نیە، هەمو ئەو پۆلێنە جیوگرافی و رەچەلەکیە بۆ بنچینەی پۆلینی ئایدیۆلۆژی و ئاینی هەلە دەردەچێ، بە حسابی دارالکفر و دار الاسلام بێت.. کە دەرناچێت وەك دەبینین بە

هەزاران مزگەوت و ناوەندی دەعوە لە ئەوروپا و ئاسیایە، بە هــەزارانیش لێـرە لـە دایـك و بـاوك و خاكێكی ئیسلامیەوە و عەقیدەكەی سوشیالیستیە یان چەپیە یان لیبڕاڵ دیموكراسی و نەتەوەگەریە.. بۆیەداوای زیاد كردنی بەندێك بۆ (مافی مرۆڤ) كە هەر كەس بتوانی بەسەربەستی ئـاییـنیش بگـۆڕێ ،تـۆبزی نـەبێت وئـاین بـەمیرات وەرنـەگیرێ، ئـەوە لەكاتیكایـە ئینتمـای (ئومـەی ئیسـلامی).. موكتەسەبە.. پڕۆسەیەكە بەردەوام پێویستی بە پەروەردە و دروست كردنە.. نەك هەر لە دایك بـووی سنورێكی جوگرافی بەناو ئیسلامی بێت ئیتر تاكێك بی لە (ئوممەتی ئیسلام).. نەخێرئینتمای ئومەی ئیسلام زكماكی و میراتی و نەتەوەیی و..نیە، دروست كردنە، جولانەوەیە لەسەرەتاكانیدا حزبایەتیشە لە(حزب الله).. ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ﴾، ڕەنگە ئەو بەندە تا ڕادەیەك بۆ ئەو ئاینانـەی میراتـین وتەبشـیری نـین نـەگونجێ وەك یەهودی وزەردەشتی وئیزیدی ...

مافی مرۆڤ لە روانگەی مدرسەكانەوە: جاڕنامەی مافی مرۆڤ بەدەسكەوتیكی رۆژئـاوایی پـەتی هەژمار دەكرێت ،ئەوەش هۆكاری زۆرە هەندێكی لەسەروو باس كرا،لەلایـەكی تریشـەوە یاسـاكانی سیستەمی سەرمایەداری بەگشـتی بـەهۆی بنـەمای (بەرژەوەنـدی تایبەت)دەخـەملیت، لـە خـودی یاساكان بەزەیی و مرۆڤایەتی تیا رەچاو نەكراوە ، لـە ئەنجامـدا كۆمەڵگەیـەكی نادادگـەری مـادی رووتی لیّ دەرچوو كەسەرچاوەی سەلبیاتی جیهان بوە، ئەوەش بنەمای فكری وفلسفی خۆی هـەبوە ، بە پیّ ی هەریەكە لە میكاڤیلی، نیتچە، هۆبز، فرۆید، كانت، .. ئادەمیزاد گورگی ئادەمیزادە، جـا ئەگەر دەسەلاتیشی هەبێت گورگایەتیەكەی بەشیوەی جیاجیا و لەبن پەردەی جوانی بەرجەستە دەكا، لەوبارەیەوە (كانت) دەڵیّ (ئەزمونەكان دەیسەلمێنن كە هەرچی دەسەلاتی هەبووبیّ خراپەی كـردووە.. هەموو لەگـەڵ هەموو..هەریەكـەش لەگـەڵ هـەموو لـە جـەنگی بەردەوامـدان)[*] ..بـەو شـێوەیە سیستەمی سەرمایەداری لە كۆمەڵێك سەرچاوەی فكری وفلسفی و ئابووری و ..ڕێزێكی وای بۆ مرۆڤ نامێنێت ، ئەو سیستەمە كەلێنی گەورەی تیدەكەویّ ، یەك لەو كەلینانە مـافی مرۆڤـە ، بۆیـە بـۆ تەواوكردنی ئەولایەنە ئەخلاقیە ئەو جاڕنامەیە دروست كراوە ، چۆنیەتی داڕشتنەوەشی لەسـەر ئـەو

---

[*] فلسفه القانون والسیاسه-عمانوئیل كانت -(تا ڕاددەیەك ئەو ڕایە لەگەل دەقی ئاینیش دێتەوە هـەروەك لـە قورئـانیش دەلی (كلاأن الانسان ليطغى إن رأى إستغنى ) .

بنچینەیە، تەنزیریشیان بۆ ئەوە کردوە کە ئـەو جارنامەیـە لەگـەل دیموکراسـی و کۆمـاری عـەلمانی وسەرمایەداری بەستراون ، ئەو رایەی (کۆتایی مێژوو) و (مل ملانێی شارستانیەکان) لەو سۆنگەوە هـاتوە کـە جگـە لەسـەرمایەداری رێبازەکـانی تـر بـەدەروازەی دیکتـاتۆری لەقەلـەم داوە، دەلـین ئەزمونەکان سەلماندوویانە مافی تەواوی دیموکراسی ولیبرالی ئۆتۆماتیکیانە مـافی مـرۆڤ بەرجەسـتە دەکات ،بەلام مادام کۆمەلگەی هەرەمیە وەك (جۆن رۆلز)دەلێت هەر گومان دەبێ لەو ریسـایە[960]، نەك گومان بـەلکو هـەر راسـت نیـە و پێکـەوە نەبەسـتراون ،بـە دەیـان نموونـە هەیـە کۆماریـە و نادیموکراسیە، زۆربەی ولاتـانی عـەرەبی عـەلمانی و کۆمـارین کەچـی دیکتـاتۆرین، لـە رۆژئـاواش: ئەزمونەکانی شیلی، ئیتالیا، پرتوغال و ئیسپانیا.. پێشوو، خاوەن بـازاری ئـازاد و عـەلمانی بـوون، کەچی دیکتاتۆری بوون دیموکراسی نەبوون.. ئەوانە مەرج نین، تەنانەت بە پێچەوانەش هەندێ جار چ لەناو ولاتانی عەرەب چ لە رۆژئاواش مەلەکیەکان دیموکراسی ترن لـە کۆماریـەکان. خـۆ بزوتنـەوەی شوڤینی فرنسی و فاشی ئیتالی و نازی ئەلمانی و ڤالانژیسی ئیسپانی.. لە هەناوی دیموکراسی بازاری ئازاد هاتەکایەوە، بەعسیەتیش لە عەلمانیەت و کۆماری هاتەدی، کەواتە پێکەوە نەبەستراون،

هەر با بە (**معجم الحدیث..**) وەلامی ئەو هەلە تێگەیشتنە بدەینەوە کە تیایدا هاتووە (لەسالانی (70-80) سەردەمی بینوشێ چالاکیە ئابووریەکانی سەرمایەداری و بازاری ئازاد بوو کەچی نەرێزی مافی مرۆڤی دەگرت و نەدیمکراسیش)، زۆربەی دیکتاتۆریەکان لەو ترازەن و خۆ نموونەی (ئەنجومەنی ئاسایشیش) کە چۆن (5) ئەندامی هەمیشەیی بێ هەلبژاردن هـەردەم ئەنـدامن و ڤیتۆشـیان هەیـە ئەوەش هەر دیکتاتۆریەتە.

ئینجا دادگەری تەواو نایەتە دی لە سیستەمێکی وەك سەرمایەداری ،ئەوە چارەسەر نییە،پینەیە بۆ سیستەم،لەنگی لە سیستەم هەیە، دەبێ لە هەناوی یاساو سیستەمەکە ئەو مادانەی هەلگرتبێت نەك بەجیا ، ئەوە دەردی بنەرەتی ئەو سیستەمەی رۆژئاوایە،سەرەرای ئەوەش سەرکەوتوو بوە لەو سەردەمە کە ئەو جارنامەیە هەم بە نیودەولەتی بکا هەم شانازیشی پێبکا کە دارێژەرانی لە کۆن ونوێوە لە ئەوروپای قەتیس کردوە .

---

[960] جون رولز- قانون الشعوب – ت:محمدخلیل ص124 .

هەرچی مارکسیەتیشە بەگشتی هەڵوێستی لە بارەی جارنامەی مافی مرۆڤ و بەندەکانی زۆر سلبیەو چەکێکی تری برجوازی لە قەڵەم داوە(وەك لەسەروو لایەنێکی باس کرا)، ئەندلەر باسی لە مافی مرۆڤی پرۆلیتاری کرد لەسالی 1927 ،پێی وایە بەرزگاری پرۆلیتاریا دەبێتە هۆی رزگارکردنی مرۆڤ لە هەمو جۆرە چەوسانەوەیەك کەبەناوی ئاینی و سروشتی وبەشەری هەلخەلەتاندنی تر دەکرێ ،ریشەی مافی مرۆڤ لە (روانگەی مارکسی) لەسەر دەستی ئایدیۆلۆجی برجوازی دێت لە سەدەی چواردەم دژ بە هەلس وکەوتی دەرەبەگ ولاهوتیەکان، سەرانی ئەو بزوتنەوەیە( بترارك ودانتی وبوکاشیو ولیوناردو دافینشی وایرازموس أوف روتردام وبرونو ورابیلیە ومونتینی وکوبرنیك وشیکسبیر وفرانسیس بیکون ..)زۆری تریش،دروشمی (ئازادی-یەکسانی-برایەتی) یان بەرزکردەوە ،کە دروشمی برجوازیە(هەلبەتە لە ڕوانگەی مارکسیەوە)، تەواو لەگەل بزوتنەوە شۆرشگێرەکان هەماهەنگ نەبوون وەك ئەوەی لەلای (مۆر و کامپانیلا)هات، ڕاڕەوی مرۆڤ دۆستی ومافی مرۆڤیش خۆی لەوە لاداوە کە کیشەی مرۆڤ مولکیەتەو سیستەمی سەرمایەداریە،لەو ڕاڕەوە هەولدراوە زیاتر مولکیەت وبنەمای (فردیەت)بوو، بۆ ئەوەیە بەها برجوازیەکان بسەپینن ، هەرلە روانگەی مارکسیەت مافی مرۆڤ ئەوەیە مافی گەدەیتی ئەویتر هەمووی سانەوین، بەڕای مارکسیەکان لەدەولەت مافی مرۆڤ نایەتەدی چونکە دەولەت خۆی مایەی چەوسانەوەی چینایەتیە ،مافی مرۆڤ (بەرای مارکسی )تەنها ئایدیۆلۆجیای پرۆلیتاری و بنەماکانی شیوعیەت و بەها بالاکانی مرۆڤایەتی فەراهەم دەبێ ،بەلام پێی وایە لە نیوان دەولەتی ئاینیەو دیموکراسی ئەوەی دوەم باشترە ، دەلێ (إن ما يسمى بالدولة المسيحية إنما هو النفي المسيحي للدولة أما الدولة الديمقراطية، الدولة الحقيقية فهي لا تحتاج إلى الدين من أجل اكتمالها السياسي)[961]، هەمو دەمیش لەگەل دیموکراسی نیە ، پێیوایە ئەوانە ساختەی سەرمایەداریە ،پێیان وایە مافی مرۆڤیش سەختەیەو تەنها بۆ برجوازیەکانە پیچەوانەی هاوولاتی بوونە، لە نیو جیهانی مسیحی ئەو مافە بوونی نیە ، ئەومافە زگماکی وخۆرسکی نیە ، سروشتی نیە پیویستە خەباتی بۆبکەی بۆ بەدەست هینانی پالپشت دەکاتە پرۆنۆپاور کەدەلێ(مسیحیەت ناتوانێ بەرجەستەی مافی مرۆڤ بکات تەنها ئەگەر واز لە

---

[961] ماركس– فى المسالة اليهودية ص12 .

مەسیحیەتی بهێنیٚ)[962] ، لە كۆتایی ڕوانگەی چینایەتیەكەی گەلالە دەكاو دەلیٚ ماف بۆ هەمو مرۆڤەك نیە دەبیٚ بۆ پرۆلیتاریا بێت ،بۆیەش دروشمی (هەمو مرۆڤایەتی بران- جمیع الناس اخوه)كە بنەچەی ئاینی هاتوەو ببوە دروشمیكی غاندی ولۆتەرو كانت وزۆری تر وەریانچەرخاندە (ئەی كریكارانی جیهان یەكگرن)[963].

ئەوە بەكورتی ڕای مەدرەسەی سۆشیالیستی وماركسی بوو ،سەبارەت بەڕای مەدرەسەی ئاینیش لەسەروو هەندیٚلایەنی باس كرا ، لە ئاینی ڕاستەقینە مافەكانی مرۆڤ بەو شێوەیە نیە, هەر خودی پەیام مافەكانی تێدایە چ تاوانبار چ تاوان لیٚكراو چ بە كۆمەلٚ چ بەتاك ...، واناكات لە شوێنێك بریندار بكەیت و لە شوێنێكی تر چاكی بكەیتەوە ، هەر لە ئەسلٚدا بریندارت ناكات ،مشكت ناخاتە مال تا پیویستت بە تەلٚە بێت، واتا لە نێو یاساكاندا لە نێو شریعەتەكدا ئەو مافە ڕەچاوكراوە پێویستی بە جاڕنامە نیە ، سیستەمێكی دادگەری پێویستی بە (مافی مرۆڤ)نیە ئاواش یاسای دادگەری پێویستی بە (محاماتی)نیە ، لە تەواوی ئاینەكان ئەو جۆرە مافانە هەبوەو هەیە ،مافی ژیان وئازادی ئاینی و مولوكداری وهەردوو بنەمای رەزامەندی وتۆبزی نەبوون بناغەی پەیوەندیە هاوسەنگیەكانی نیوان پیكهاتە جیاوازیەكان دیاری دەكات، پەیوەندی ئاینە جیاجیاكانیش دیاری دەكات (بڕوانە بەلگەنامە دەستوریەكانی مەدینە) ، لە ئایندا هەر دان بە هاوولاتیبوون نیە بەلكو دان بە بوونی پیكهاتەش دەنریٚ وەك لە هەمان بەلگەنامە هاتوە ،تا دەگاتە مافی معارەزەیی هەروەك لەسەروو باسی ڕایەكەی ئیمامی علی كرا، لەدوای ئەویش هەریەكە لە (غزالي — احياء الدين),(ابن ازرق- بدائع السلك...),(ماوردي — تسهيل النظر),(ابن طقطقي — الفخري في الأداب السلطانية)باسیان لة(حق الجارة, حق السلطان, حق المستوطنين من المملوك, حق الفواميس, حقوق الآدمين, حقوق الأسترعا, حقوق الزوج, حقوق السطان على وزير, حقوق السياسة المسترع, حقوق واجبة للرعية, حقوق وزير على سطان... ) كردوە[964] .

---

[962] فى المسألة اليهودية –ص 19–20

[963] لينين –المختارات ج1 ص542

[964] بۆ زیاتر سرنج بدە : موسوعة منطلقات العلم الأجتماع والسياسية في الفكر الأسلامي.

باسی له فارس کردوه ،ئەو میلەتانەی گرنگیشیان به زانست نەداوه لەپیش هەموان چین وتورك ،پیشی وایه ژینگەو گەرمی وبەهای بیابان کاریگەری خۆی هەبوه بۆیه ناوچەزۆر گەرمەکان یان زۆر ساردەکانی له میلەتانی نەفام هەژمار کردوه[983] .

عادەتەن نەفامی ودۆگمایی پێکەوه دەگوزەرێن له قورئانیش وا دەڵێ (قالوا يا شعيب أصلاتك تأمرك أن نترك ما يعبد آباؤنا أو أن نفعل في أموالنا ما نشاء)، ماوه بڵێین یاسای نەفامی مانای یاسای خراپ نیه مانای بێیاسایی دەگەیەنێ زیاتر، بێیاسایش خۆی لەخۆیدا جۆره یاسایەکه ،ئەگینا یاسای خراپیش هەبوونی چاکتره له بێیاسایی ،بەتایبەتی ئەگەر سەروەر بوو ، هەرلەسەر ئەوبنچینەیه دەولەت و دەسەلات بەیاسای نەفامی دروست ناکرێت ،ئەوەی پێی دەووترێت (نۆمۆکراسی :دەسەلاتی یاسایی)لەدوو وشه پێکهاتوه :نۆمۆ واته یاسا (یان شریعەت-ناموس)ووشەیەکی عەجەمیه دوور نیه کوردی یان فارسی بێت پەڕیتەوه یۆنان (له نامه هاتوه)،بڕگەی دوەم کرات واته دەسەلات وحوکم دەگرێتەوه .

## کێشەی ئەعراب و نەفامی له فقهدا

کێشەیەکی وانیه له ئاوێته بوونی نەفامی وئەعرابی هەتا ئەوەی پێی ووتراوه (ايام العرب).. وەك (جرجانی) ئەعرابی وجاهلی پێکەوه بەستوەو دەڵێ (اعرابی هو الجاهل من العرب)[984]، له ڕاستیدا ئەعراب و نەفامی و (ايام العرب) هەرگیز قەتیس نەماوه له نێو کۆمەلگەی بەدەوی ، ئەو بەهایەی جەنگ وپەلامارو ستەم کردن شانازی نوسەرو ڕەوشەنبیرو شاعیرو هەمولایەك بوه، شانازی ناسنامه به جەنگ وپەلامارو ستەمکاری زیاتر بوه وەك ئەوەی ناوی لێنراوه (ايام العرب)، تەنانەت معاویه کوری ئەبوسوفیان نیوەی شەوەکانی به (ايام العرب) بردۆته سەر[985]،لەو ڕوانگه نەفامیەوه زاراوەی موالی هاتەوه مەیدان کەلەسەردەمی پیش ئیسلام بەکۆیلەکان ووتراوه موالی ،ئەوەی کیشەیه بەشی

---

[983] صاعدی اندلسی —طبقات الامم ص5-9.

[984] جرجانی – التعريفات ص24

[985] بۆ پرسی زاراوەی (ايام العرب)بڕوانه : د عبدالستار جبير- الهوية والذاكرة الجمعية ص11 وص18وص19

زۆری فەرهەنگ وتیگەیشتنە فقهیەکان هەولیان داوە چەمکی ئەعرابی لە مانایەکی جوگرافی قەتیس بکەن ومانا کۆمەلایەتی وباوەڕی وناشیۆنالیزمی لێدارنن ، بەزۆری دەلێن مەبەستی قورئان لە زاراوەی ئەعراب خەلکی گوندان و بیابان و(بەدو) بوە، دەرەوەی شار ،مەبەستی خەلکی شاری نەبوە، قورەیش ئەوانەی لەشاربووینە ئەوانە نیە، دەیانەوێ بلێن مەبەستی عرب نیە ..، هەندێکیان ڕاستەوخۆ تر دەلێن (وبدو العرب هم الاعراب)[986] ،ئەدی ئەوە نیە لە قورئان لە سورەتی (یوسف)باسی (بەدوی)کردوە (وجاء بكم من البدو) ، ئەگەر وابوایە ناوی بەدەوی و ئەعرابی بە جیا نەدەهێنا، قورئان وپەیامی خودا زۆر لەوە گەورەترە پۆلینی مرۆڤ لەسەر بنچینەی جوگرافی بکا ،لەسەر بنچینەی گوندی وشاری ،بیابانی وشاخی ،ئەفریقی وئەوروپی بکا ،(وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالا نُوحي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ القُرَى - مانای وایە ئەو پیغمبەرانەش اعرابین لە گوند هاتون!) ، پیغمبەر خۆی نێردرا دەرەوەی شار بۆ وەرگرتنی نەریتی چاك ودوورکەوتنەوە لە نەفامیەتی شاری ئەوسا، ئەو پۆلینەی بیابانی وشاری پۆلینی فلسفەی یۆنانی و هەندێ جار مەسیحی ویەهودی لادراویش ئەو پۆلینەیان پەیڕەو دەکرد ، خودی ئەو پۆلینەش نەفامیە ، لە(قاموس الكتاب المقدس - دائره المعارف الكتابيه المسيحى ) زاراوەی (اعراب) بەمانای (دەشتەکی) وەرگیراوە لە فەرهەنگی یەهود نەك ئیسلام ،لە (هەمان قاموس دەلێ: وكانت كلمة أعرابي تعني لليهود سكان القفار المتنقلين أكثر مما تعني سكان المراعي الذين يتحضّرون ويستقرون وخاصة المتنقلين منهم قرب الهلال الخصيب (اش 13: 20 و2 أخبار 21: 16)، لە بنەچەدا ووشەی (عرب) لە زمانی کۆنی سامی بە (بیابان)ووتراوە[987] ،واپێدەچی ئەو تێگەیشتنە ڕەنگی دابێتەوە سەر نەریتی یۆنانی و دابەشی چینایەتی جۆربەجۆرو تێڕوانینیان بۆ دابەشی بەشەریەت لەسەر بنچینەی ژینگەو جوگرافیا بە جۆرێك ئەوروپا بە بالاو ئاسیا بە نزم ،ڕۆم بە ڕەسەن وخەلکی تر بە نارەسەن ،خەلکی شار بە نەجیبزادەو

---

[986] قاموس المصطلحات الاقتصادية فى الحضارة الاسلامية ص84

[987] قاموس الكتاب المقدس | دائره المعارف الكتابيه المسيحى-الماده:عرب

خەلكی دەشت بە نەزان ونەفام ، زاراوەی دیمۆس كە دوای بوە بنچینەی دیموكراسی لەودابەشیە هەلەیە هاتوە،ئەگەر چی لەبنەچەدا دیموكراسی بە مانا عەجەمیەكەی (ئیزۆنومیا) بەمانای (یەكسانی لەبەردەم یاسا) هاتوە[988] ،دوای كەمیك ناوەڕۆكی گۆڕاوە وبەچەند قۆناغیێك ڕەت بوە ، دیمۆس بە مانای (ناس) لەگەل گوندنشینیەكانی بوە، لەسەدەی 5 پ ز چەمكی دیمۆس گۆڕا بۆ ئەو هەمو خەلكەی بەكاری حكومەت خەریكن (واتە گوندی وشاری) ،لەسەدەی 509پ ز گوندیەكان دەستیان بەسەر حوكمی ئەسینا داگرت وناوی دیموكراتی هاتە كایەوە بەمانای حوكمی گوندی ودەشتەكی .دوای بوە حكومەتی گەل[989]، هەرچی خەلكی بیابانیە زاراوەی (**ساراسێنس– Saracens**) بۆ كارهاتوە، لە ووشەیەكی یۆنانیەوە(**Σαρακηνός**)ئەویش لەلاتینی وەرگیراوە، بۆ خێوەت بەكاردەهێنرا، دواتر ووشەكە بۆ عەرەبەكان بەكاردەهێنرا، كە بە واتای دانیشتوی خێوەت و بۆ ئەو كەسانەی بیابانین و كۆچەرین ،كەسانێك كە توند و دلّڕەقن، بەجۆرێك ئاگایان لە ژیانی شارستانی نیە. لەگەلّ ئەوەی ئەم چەمكە بۆ عەرەبەكان بەكار دەهێنرا، دوای بۆ هەمو موسولمان بەكاردەهات ،بیّ گومان هەندێك لێكۆلّەری دیكە بۆچونیان وایە كە ساراسێنس لە وشەی "سارا" خێزانی بچوكی حەزرەتی ئیبراهیم دایكی ئیسحاق پێغەمبەر (د.خ) وەرگیراوە. بەلاّم لەلایەن ڕۆژهەلاّتناسەكانەوە وەك ئیبتیزازكردنی عەرەبەكان و موسلّمانان بەكاریان هێناوە، بەگشتی ووشەی (عرب) : تعني في اللغات السامية "القفر" أو "البادية". جاء في (تثنية21/32) قوله " هُمْ أَغَارُونِي بِمَا لَيْسَ إِلهًا أَغَاظُونِي بِأَبَاطِيلِهِمْ. فَأَنَا أُغِيرُهُمْ بِمَا لَيْسَ شَعْبًا بِأُمَّةٍ غَبِيَّةٍ أُغِيظُهُمْ".

لە كتیبەكانی قبتی ومسیحی (امە الغبیە)لەگەل عەرەبیەتی،هەندی زانای ئیسلامیش ئەو ڕایەی هەیە - قال الشيخ رحمه الله الهندی : المراد بالشعب الجاهل هم العرب لأنّهم كانوا غاية الجهل والظلم

[988] T. Asinclair-Ahistory of Greekpolitical thought p36

[989] د علی اكبر ولایتی – موسوعە الاسلام والایران ج3 ص133

ولم يكن عندهم علم من العلوم وما كانوا يعرفون إلا عبادة الأوثان[990]. جمال بەنا دەلی کۆمەلگەی عربی پیش ئیسلام جگە لە (نەفامی )هیچ وەسفیکی تر هەلناگریت ،چونکە هەر خەریکی قوماروخواردنەوەورێگری وتالان وپەلاماری لەخۆ لاوازتروکۆیلایەتی و..ئەوە ببوە بەشیك لە کەسیتی عربی[991] .

لە بەرامبەر ئەو بۆچوونانە وەك کاردانەوەیەکی دەمارگیری بەشی هەرەزۆری فەقیهەکانی کاریگەر بە بیری عروبی وئەمەوی عەرەبیان بە (افضل القوم)لای خودا ریزکردوە ،بەپیچەوانەی سیستەمی قورئانی کە لەویٚ باسی (اعراب)دەکا لە فقها کەمتر ئەو زاوە دەمینیت بەلکو دەبیتە (عرب)،کەچی کوردو تورك وعەجەم دەبنە (اکرادواتراك واعاجم..)،هەولدراوە فەزلی عرب پیشان بدەن ، بۆ ئەو مەبەستەش هەولدراوە دەستکاری میژوو وفەرمودەو هەتا تەفسیری ئایەتیش بکەن ،دەستکاری زاراوەکانی قورئانیش کراوە ،لە مەزهەبی شیعە لەتەفسیری (الله نور السماوات والارض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح المصباح في زجاجة الزجاجة كانها كوكب دري يوقد من شجرة مباركة زيتونة لا شرقية ولا غربية يكاد زيتها يضيء ولو لم تمسسه نار نور على نور يهدي الله لنوره من يشاء ويضرب الله الامثال للناس والله بكل شيء عليم )دەلین (نورين)لەلەگەل (ح حس وحسين)یەتی ، مەزهەبی سونەش لە میانەی ئەو دەستکاریانە هەولیان داوە زاراوەی قورئانی (اعراب) دەستکاری بکەن بە قازانجی عەرەب، لەگەل ئەوەش دانانیکی خیراش بەوە دەکا کە مەبەست لە ئەعراب عەرەبی هەرە رەسەنە ،واتە ئەو عەرەبانەی تەواو لەژیر کاریگەری نەریتی عەرەبن ، لەو بارەیەوە ئیبن تەیمیە دەلیت : : (فغلب على العرب القوة العقلية النطقية، واشتق اسمُها من وصفها فقيل: عرب من الإعراب، وهو البيان والإظهار، وذلك خصوصاً القوة النطقية.. ولهذا كانت العرب أفضل الأمم)[992] ،

---

[990] كتاب إظهار الحق- ج2ص208و209.

[991] جمال البنا –المرأة المسلمة بين تحرير القرأن وتقييد الفقهاء ص17

[992] ابن تيمية - مجموع الفتاوى ج15ص431

لة(اقتضاء صراط المستقيم) دةشلىَ : (واعلم أن لفظَ الأعراب هوَ في الأصل اسم لسكان باديةِ العَرَبِ، وإلاَّ فكلُّ أمَّةٍ لها حاضرة وبادية، فباديةُ العَرَب الأعراب، وبادية الروم الأرْمَن، وباديةُ الفُرْس الأكْرَاد، وباديةُ التُرْكِ التركُمَان، فسائر سكان البوادي لهم حكم الأعراب سوَاء دخلوا في لفظِ الأعراب أم لم يدخلوَا. فجنسُ الحاضرة أفضل من جنس البادية،..) ، زياتر لەوەش هەوليان داوە نكولى لەوە بكەن كە كۆمەلگەى عربى نەفامى بوە پيش ئيسلام ، دان بەوە نانێن كە ئيسلام كۆمەلگەيەكى نەفامى وەرچەرخاند بۆ كۆمەلگەيەكى مرۆڤايەتى (ئومە)،بەلكو دەلێن خاوەنى بەهاو نەريت و ريكەوتن وياساى جوان بووينە ،ئيسلام پيويستى بەو شوينە هەبوە ، نەتەوەى عەرەب پەيامى ئيسلامى بۆ هەموو نەتەوەكان هەڵگرتووە، وەك شبلى عيسمى دەڵێ: (أحياناً العروبه أوسع من الإسلام)[993]، ميشيل عفلق دەڵێ: (العروبه جسم والإسلام روحها)، لەكتێبى ( العروبه بين الشعوبيه والاستعمار) دەليت ئيسلام ومرۆڤايەتيش پێويستيان بە ئەخلاقى عەرەب بووە نەك پێچەوانە، دەلێ خواش بۆ پيادەكردنى پەيامەكانى پێويستى بە ئەخلاقى عرب هەبوە!!، خەريكە وەك (موسا بن مەيمون)بڵێت پيغمبەرايەتى زروفى زاتى ومەوزوعيە عەقليكى بالاو زەمينەيەكى لەبار پيغمبەر بەرهەم دێت نەك هەر بە پەيام ،لەسەر ئەو بنچينەيە بەشێك پێيان وايە پيش هاتنى ئيسلام عەرەب لە (سەردەمى زێڕين)بوە نەك نەفامى وجاهلى[994] ،بەهەمان شێوە (محمدالميلى)زۆر بەتوندى بەگژ ئەو ڕاستيە دادەچێتەوە ودەلێت گەورەترين ستەم لە عرب كراوە كە دەلێن عەرەب نەفام وهەمەج بووينە تا ئيسلام هاتوەو ڕێى پيشانداون [995].

بەكورتى نيشانەكانى كۆمەلگەى نەفامى كە لەكۆمەلگەى عربى پيش ئيسلام بەرجەستە ببوو، ئەوانەن :

1-دەبل ستاندەرى لە ياسا (الكيل بالمكيالين)لە هەمو ڕوەكانى كۆمەلايەتى وسياسى وئابوورى.

2-ياساى (انصر اخاك ظالما او مظلوما) لەسەر بنچينەى خزمايەتى وخيلەكى .

---

[993]العلمانية والدولة الدينية ص213 .

[994] د الياس فرح- من قضايا الثورة والانسان العربى ص190

[995] محمد الميلى –ابن باديس وعروبه الجزائر ص212

3-تیروانینیان بەرامبەر ئافرەت جاریەو کۆیلە و..(سیستەمی وأد البنات) .

4-بتپەرستی ونەناسینی خودای راستەقینە .

5-هەر کەسیك لە خیلەکەی ئەو نەبوایە بە(بیگانە)ناوزەد دەکرا ئۆتۆماتیکی بە تاوانبارو نەیار هەژماردەکرا .

6- یاسای دارستانی بەهیز بیهیزدەخوات...

چینایەتی کۆمەلایەتی - مادام خوا بەردی گەورەو بچوکی داناوە ئاواش بەشەری بچووك وگەورەی دروست کردوە .

8-لە نەفامی هەق بە هیزو سەرکەوتو دەقبورا ،رۆژمیری ( ایام العرب)بریتی بوو لە شەڕو خوێن ڕشتن وستەم بە شانازیەوە لە(ایام العرب)تۆمار دەکراو سالانە ئەو برینە دەکۆلیندرایەوە .

بەگشتی بوونی فرە خواو بت و رۆژوئەستیرەومانگو ئاسمان ونوینەری سەرزەویشیان وادەکا مرۆڤ کاری هەمو بکەوێتە سەر خواست و پاڕانەوە نەك کاری بازووی خۆی، ئەوەش وادەکا کۆمەلگەی نەفامی گەشەی زۆر سست بێت، بە سەدەیەك بە ئەندازەی 24سەعاتی ئیستا گەشەی نەبوە ، ئەو هەمو خواوەندە وای کردوە عەقلیان گەشە نەکاو لە نەفامی بمیننەوەو ئیعتماد نەکونە سەر ئەسباب و خۆبدنەنە دەست قەدەر ، کۆمەلگەیەکی شەڕانی وپەرتەوازەببێت، هەرلەوەشەوە دەبینین زۆربەی خوایە دەستکردەکان زیاتر خوای شەڕن ، ئەشتار خوای جەنگی ئاشوریەکان بوو، خوای میلەتی ئەنکا ناوی ئانتی بوو هەردەم تووڕەو شەڕاوی بوە، خوایەکی سۆمەریەکان بە ناوی ئانۆ لە شیوەی مانگای تووڕە ، ئۆدنیش خوای جەنگی ئەسکندینافیەکان بوە ،ئۆنیرۆس خوای جەنگی میسریەکانی کۆن بوە ، ئیرینیس خوای ئەگریکیەکان بوو بۆ تۆلەسەندنەوە ،ئیراناگی خوایەکی میلەتانی ژاپۆنی جەنگی بوە ، ئینۆ خوای جەنگی ئەگریکەکان بوو،تاسنۆپ خوای جەنگی حیسیەکان بوە [996] ، ئەوە بۆهەر میلەتێك لەکۆمەلگە دواکەوتوەکان هەر حێلێك خوایەکی هەبوو وەك کۆمەلگەی عربی جزیرە .

**یاسای سروشتی (یەك ستاندەر)-بانیك ویەك هەوا-دادگەری -هەق:**

---

[996] قاموس الخرافات ەالاساگیر ص32 ،ص42 ، 56 وص57وص60 ،ص86

بۆ ئەوەی بزانین سەرچاوەی دەبل ستاندەری یاسای نەفامی لە کێوە دێت،پێویستە ئەوە بزانین کەیاسای بەڕاستی یەك ستاندەرە ،یاساکانی سروشتی و یاسای کۆمەلایەتی ڕەسەن یەك ستاندەرە ،واتە نەفامی هەلناگریت ،ناتوانرێن دووجۆرە پێوانی پێبکریت، ناکریت یاسای کیش کردن بۆ چینیك هەبێ وبۆ چینیکی ترنەبێ،بۆ موسولمان نەبێ بۆ یەهودی هەبێ ،ئاوا نیە ،بۆهەموەو لەهەمو زەمان وزەمینیك ، ئەوەش زیاتر لە بەراوردلە نێوان سیفاتەکانی یاسای سروشتی (یاسای خوایی )لەگەل یاسای بەشەری (ئەو یاسایەی بەشەر ناوی یاسا) ،لەکۆتایی دەردەکەوێ یاسای بەشەری یاسای تەواو نیە ،بەلکو ناوی نراوە یاسا ،ئەگینا (یاسای نەفامی) هەرنیە وەك (دومینیك اورفوا) دەلێت مادام چوویە مەیدانی نەفامی مانای چوویە دەرەوەی یاسا، دەبیت ئەو کاتی دان بەوەش بنێین فرە یاسایی هەیە ..کەنابێت، یاسای دەبل ستاندەر وچەند ستاندەر هەرنیە ،هەریەك ستاندەرە ،ئەوەی خوارەوە سیفاتەکانی یاسایە کە دەری دەخات بواری دەبل ستاندەری نیەو واتە بواری (یاسای نەفامیش)نیە،بەبەراوردی نێوان یاسای راستەقینەو یاسای نەقامی گوزارشی دەکەین :

1-یاسای راستەقینە بریتیە لەدووبارە بوونەوەی ڕێك وپێك بەپێی زنجیرەی (سبب)ی ،لەکاتیکا یاسای نەفامی بە دەگمەن دووبارە دەبتەوەوبە نارێك وپێکی .

2-یاسا سیفەتی زەوجی نیە،دژی نیە ، دژی یاسا یاسای نەفامی نیە ،یاسای نەفامی دژی هەیە دژەکەشی مەرج نیە یاسای سروشتی وخوایی بێت دەکرێ یاسایەکی تری نەفامی بێت..

3- لە ڕووی فلسفی قوول یاسای سروشتی سەر بە ڕەهەندی مادی نیە ،بەلکو ڕاستی نامادیە،خلق نیە بەلکو ئەمرە،بەرجەستەی ئەمرە، لەکاتیکا یاسای نەفامی سەر بەڕەهەندی یەکەمە (مادیە —خلقە - ..)[997]

4-یاسای سروشتی و(یاسای هەق) یەکەو تاقانەیە،یەك وەلام ویەك حوکمە،هەرچی یاسای نەفامیە وچەوت وهەلەو کۆیە، فرە وەلام وفرە ڕێگەیە،5x3 تەنها دەکاتە 15 لە یاسای سروشتی،هەرچی وەلامی یاسای نەفامیە وەلامەکەی ئەوەستێتە سەر بەکارهێنەری بریتیە لە هەزاران هەزار وەبگرە بێ کۆتایی،هەریەکەلە 20 و16 و100..هەمو وەلامن بەلام وەلامی چەوت ونەفامین،دوو وەلامی

[997] بۆ تیگەیشتن لە پرسی ڕەهەندی یەکەم ودوەم بڕوانە:تویژەر– رۆشي فلسفي سەدەی 21– ل 222

ڕاست پیکەوە نیە لەیەك كاتدا،لەسەر ئەو بنچینەش هەرچی بە (یاسای هەق) هاتوە لە قورئان بە(تاك-مفرد) گوزارش كراوە:( الله ولي الذين امنوا يخرجهم من الظلمات الى النور والذين كفروا اولياؤهم الطاغوت يخرجونهم من النور الى الظلمات ..)[998] (ظلمات) كۆیەو(نور)یش تاكە،تیكڕای ئایەتەكانی قورئان ئەو سیفەتەی هەیە (یاسای هەق) بە تاك گوزارش دەكا ویاسای نەفامی(یان یاسای ناهەق) بە كۆ، واتە ڕێی هەق ناسك وتاكانەو قوڕسە(..اكثركم للحق كارهون)[999]، ڕێگاو وەلامی یاسای نەفامی وناهەق فراوان وزۆرو ئاسانە، یاسای نادادگەری فرەیە ئیمام علی دەلێ:العدل صورة واحدة،والجور صوركثيرة،لهذا سهل ارتكاب الجوروصعب تحرى العدل).

5-هیچ جۆرە چارەسەری مام ناوەندی ونیوبژی لە نیوان یاسای هەق و یاسای ناهەق(نەفامی)نیە ، ناكرێ بلێی مادام دوو وەلام بۆ 5x3 كە بریتین لە 12 و20 ئەوا وەك نیوبژی با16 بیت .

6-ناسینەوەودیاری كردنی یاسای هەق ویاسای نەفامی ناكەوێتە سەر زۆرایەتی وكەمایەتی،ئەگەر هەمو خەلكی سەر زەوی ووتی 5x3 دەكاتە 16 ویەك كەس ووتی (یان نەیووت)دەكاتە 15 ئەوا كەمایەتیەكە ڕاستە.

7-یاساكانی سروشتی خۆبە خۆ و لەگەل یاساكانی كۆمەلایەتی و لەگەل سەرجەم یاسای هەق یەكتر پاسادان دەكەن ودەبنە پالپشت بۆ یەكتر ،یەكتر تەواو دەكەن بۆ سیستەمی یاسای گەورەتر ،بە پێچەوانەی یاسای نەفامی ناكۆكن لەگەل یەكترویەكتر(نەسخ)دەكەن...، ناكرێ بلیی با یاسایەكی تەوفیقی،یان سیستەمیكی دادگەری پیكهاتوو لە هەمو لایەك پیك بهینین ...ئەوانە دەكرێ بۆ ژیانی سادە،بەلام ناكرێ بۆتەرازووی دادگەری ، لەوەوە بۆمان دەردەكەوێ ئەو بوونەوەرە سەرتاپای هەماهەنگە نەك (ناكۆكی-تناقظ) .

8-یاسای سروشتی و هەق بوونێكی سەربەخۆی هەیە بەند نیە بە جم وجۆلی زانیاری ئێمە، بەلكو بە چەسپاوی لە شوێنی خۆیتی بە پێی یاساكانی خۆی كاردەكا، ئێمە دروستی ناكەین بەلكو دەیدۆزینەوە ، یاسای نەفامی دروست دەكرێ نەك دەدۆزرێتەوە .

[998] سورة البقرة – آية 257

[999] زخرف اية78

9- یاسای هەق پیر نابیٚ،خۆی نویٚ ناکاتەوە، تەمەنی نیە بیزەمەنە، نەمرە،یاسای کۆن ونوێی نیە ..ئەوە زانیاری ئیمەیە پیر دەبیٚ ودەمریٚ ونوی دەبیتەوە..یاسای نەفامیش کۆن دەبیٚ ولەناودەچیٚ، تەنها زانیاری ڕاستەقینەی مرۆڤ (کە بە ڕاستی هەقی دۆزیتەوە) نەمرە،دەبیتە (کلمة الطیبة) ، ئەو کاتە نابتە یاسا بەلکو یاسا دۆزراوە .

10- یاسای هەق (نەگۆڕ "ثابت"، نەمریشە "خالد") ناکەوێتە سەر زەمان و مەکان (... وکل امر مستقر )[1000]، ئەو یاسایەی ڕاست بوو پێش هەزاران سال لە ئێستاش هەر تەواوە، لێرە و لە ئەمریکا و لەسەر مەریخ (3 جاران 4 یەکسانەبە 12) ، هەرچی یاسای نەفامیە بەردەوام لە گۆڕاندایە بە هەمو ئاڕستەیەك .

لەوەوە دەردەکەویٚ کە نەفامی یاسای نیە بەلکو ئیمەیینناومان ناوە یاسا لەبەرامبەر یاسای هەق بۆ تێگەیشتن ، تەنانەت یاسای خراپیش هەیە جیایە لەگەل یاسای هەق ولەگەل یاسای نەفامی ، بەو جۆرە هەمو یاسایەکی ناهەق بە نەفامی دانانرێت ،مادام یاسا سەروەر بوو بۆهەمو کەس بەیەکسانی بیت ئەوە لەنەفامی دەردەچێت بەلام مەرجیش نیە بگاتە ئاستی یاسای هەق ،جا ئەو یاسایە ئاینیە لیبرالیە شیوعیە مادام سەروەرەو کەس لەو بەرز تر نەبیت یاسای نەفامی نیە ،ئەو کاتە دەبیتەنەفامی(جاهلی)کە بۆچینی دەسەلات ودەولەمەند وبەهێز جۆریك بێت وبۆ چینە هەژاروبیهیزەکانیش بە جۆریکی تر بێت(جا با ئەو یاسایە ناویشی شریعەت بیت) ،هەتا یاسای خراپیش بە نەفامی وەسف ناکا مادام بۆ هەمولایەك وەك یەك بیت ،کەواتەلە هەموباریك بوونی یاسا لەنەبوونی باشترە ،ئەوەیان لەسەردەمی ئەفلاتون هەستی پیکراوەو جەختی لەسەر کردۆتەوە ، کەواتەدەتوانین بلێین یاسای نەفامی و یاسای هەق شیوەیەك لە نسبی وەرگرتوە ،،ئەوەیان تاڕادەیەکی زۆر پەسندە بۆ سەردەمی ئیستا (سەردەمی گواستنەوە) .

نەبوونی یاسا یان فرە یاسا بۆ یەك دۆز مانای نەفامی دەدا ، نمونەی نەبوونی یاسا لەو سەردەمە وەك لە مەدرەسەی شیوعیەت بانگیشەی بۆ دەکریٚ زیاتر،(لینین) پیٚی وایە وەك چۆن خەلکی ناهێلن دووکەس شەڕ بکەن ئاواش بۆ کیشەکانی تر یاسای ناویٚ خەلکی خۆیان یاسان

---

[1000] القمر- اية3

لەقۆناغی شیوعیەت[1001]، ئیتروەك چۆن بڕیاڕی بیبریاران بڕیاڕە،مەزهەبی بیمەزهەبان مەزهەبە،بە هەمان شیوەش وبێیاسایی یاسایە، بەلام یاسای نەفامیە ،

**یاسای نەفامی ویاسای هەق لە ژیانی کۆمەلگەدا:** پرسیاری بنچینەی لەو بابەتە ئەوەیە کەئەوەی پانتایی میژوو واقعی ئیستا پیکدەهێنێ یاسای نەفامی بوە یان یاسای هەق ؟ ئەی لە داهاتوو هەروا دەبێ ؟ هەموو یاساکانی نەفامی وەك یەكن ؟ باش وباشتر نیە خراپ وخراپتریش نیە ؟ یان هەندیکیان تەنها رەهەندی نەفامی تیدایە؟

سەرەڕای ئەوەی لەسەروو بەراوردی نێوان یاسای سروشتی و یاسای نەفامیمان بەگشتی کرد ، ئەوەیان لە ڕووی میکانیکی بوو،ئەگینا یاسای سروشتی مەرج نیە بۆ کۆمەلگە بگونجێ ودادگەری بۆ بهینیتە دی وەك هەندێ لە مونەزیرانی لیبرالی پێی وایە ئەگەر یاسای سروشتی کرایە بنچینە بۆ یاسای کۆمەلایەتی دادگەری دیتەدی ، لەوەوە مارکسیەکانی وهەندی فەیلەسوفی مادی تریش بەجۆریکی تر پێیان وایە مرۆڤ بەشیکە لەسروشت، شوبنهاور لە (وحدة الطبيعة والعقل)دەلێ ر وح وعەقل یەکەو بەشیکن لە سروشتیش[1002] ،زۆربەی فەیلەسوف وتەیارە مادیەکان ووتویانە ژیان بریتیە لە سێ ڕەهەند (خوین وئیسك وگۆشت) وروحیش هەر بەشیکە لەو سێ رەهەندە ، هۆلْباخ و مارکس دەلێن مرۆڤ چیە تەنهابریتیە لەسێ ڕەهەندی مادی (گۆشت و خوێن و ئێسك )[1003]،بەشێکە لەسروشت ،زۆری تر پێیان وایە پەیڕەوی یاسای سروشتی دادگەری دەهێنی ،ئەوانە پێیان دەووترێ فیزیۆکراتیەکان - ئەوانەن کە یاسای سروشتی دەکەنە بنچینە دادگەری کۆمەلایەتیش و دژی دەستتیوەردانی دەولەتن لە باری سروشتی کۆمەلگە ، لە پرۆتۆکۆلی ژ:1یش واهاتوە ( أنهم لم يروا أنه لا مساواة في الطبيعة، وأن الطبيعة قد خلقت أنماطاً غير متساوية في العقل والشخصية والأخلاق والطاقة. وكذلك في مطاوعة قوانين الطبيعة )، بەپیچەوانەش بەشیکی ترپێیان وایە یاسای جاهلی تا

---

[1001] الدولة والقانون فی الاتحادالسوفیتی –تالیف:مجموعة من علماء سوفیت ،ت: هنری ریض (ترجمت باسم (القانون والاشتراكية) ص20

[1002] المثالية الألمانية ص233 .

[1003] الموسوعه الفلسفيه ص291

رادەیــەکی زۆر لــە یاســای سروشــتی دێــت...[1004]، پــەیڕەوی فیزیــۆکراتی نــەفامی دەهێنێــت ، ڕاستیەکەی ئەوەیە یاساکانی کۆمەلایەتی جیایە لەگەل یاسای سروشتی ، لە سروشتا بەهیز بێهیزدەبا ، یان جاروایە یاسایەکی سروشتی دەکەنە ڕیسای کۆمەلایــەتی و دەلــین خوابــەردی گــەورەو بچــوکی داناوە ..نەخێر وانیە یاساکانی سروشت دادگەریە بۆ سروشــت .. کــە دەبتــە یاســای کۆمەلآیــەتی و چینایەتی دەبتە زولم، دەبێتە ریسای خێڵەکی وکەلتورو نەریتی هەلە، خوا بەردی گــەورە و بچــووکی داناوە..ئەوە یاسایەکی سروشتیەنەك کۆمەلایەتی، ،بۆیە واچاکە یاسای کۆمەلایەتی بەناوی (یاســای هەق)ناوزەد بکەین بۆ جیاکردنەوەی لە یاسای سروشتی .

لەژیر رۆشنایی ئەو دەروازەیە ئیستا دەتوانین بەلای وەلامی پرسیارەکانی سەروو دابچین ،دەتوانین پەیوەندیەك لە نیوان یاسای نەفامی وئایدیۆلۆجیاو ئاین وکۆمەلەبەشەریەکان بدۆزینەوە ، هەندێ ڕای موتلەق هەیە دژبە یەکتر وانیە، بەشیکی زۆر دەلێن میژووی پیش ئیسلام تەنها جزیرەی عرب بە یاسای نەفامی کاری کردو، جەنگ وشەرە خیلەکی بوە [1005]،چەند یاسایەك دروست ببو ،یاسای تۆلەو پشت و ..تا دەگاتە(انصراخاك ظالما اومظلوما).

مەرج نیە هەرچی ئاینی نەبیت یاسای نەفامی بیت ،مەرجیش نیە هەرچی ئاینی بیت تلیاك ودڕندە بیت ،هەمو شەرەکانیش ئاینی نەبووینە، لەبارو دۆخی ئیستاش هەروایە ، هەتا پیش عوسبەتولئومەم(1919) شرعیەت بە یەکلاکردنەوەی کیشەکان لە ڕێی جەنگ هەبوو ، زۆربەی میژووناسان بەلای ئەوەن کە پانتایی میژوو زیاتر بە یاسای نەفامی پڕ بوویتەوە تەنانەت ڤۆلتیر دەلیٚ میژوو بریتیە لە تۆمارگای تاوانەکانی بەشەریەت ،(ئەریش فرۆم)یش هاوڕایەو دەلیٚ : میژوو گۆڕی فەرهەنگە عەقلانیە مەزنەکانە [1006] ،ناچار بەشێك لە عاقلمەندانی ئاینیش تەقەلای ئەوەیان داوە میژووی ئیسلامی وخودی ئیسلام لیٚکجیابکەنەوە ، لەوانی (د احمد جلبي)دەلَیت : عندما اخرج

---

[1004] قانون الشعوب ص33

[1005] الموسوعه العربيه ج4ص342

[1006] د على اكبر ولايتى وسوعه الاسلام وايران ج3ص159

جورج زيدان : التحدث(الاسلامي)خلط فيه ما هو اسلام وبين ما فعل و المسلمون تخرج فيه باللائمة علي مسلمين اكثر مما تحرم دورهم الحضاري)[1007] .

بەشێکی ترواى دەهۆننەوە گوايە ڕابوردوو نەفامی وئيستاش سەردەمی عەقلانيەت وڕوناکی وئاشتی وياسای مرۆڤايەتی ، دەلێن پيش کۆمەلگەی ليبرالی نەفامی بوە ،3نيشانەی کۆمەلگەی ليبرالی کە گوايە گوزارش لەو ڕاستيەدەکات پيچەوانەی نەفاميە (1- سياسی: حکومەتی ديموکراسی2- قانونی : دەستوريکی ستاندەر3-کۆمەلايەتی: هەستيکی هاوبەشی مرۆڤدۆستی(وەك ستيۆرات ملووتی)-ئايديۆلۆجی:هەق ودادگەری) [1008]، ڕۆسۆش لە (عقداجتماعی) دەيەوی دادگەری و بەرژەوەندی يەکخا ،ئەو بۆچوونانە ئاوانيە کۆن نەفامی بووبێت وسەردەمی ئيستاش ڕووناکی ودادپەروەری بێت ، ئەوەتا هەمو رۆژئاوا دان بەوە دەنێن کە پەيوەندی نيودەولەتی بەهەر شيوەيەك گوزارش بکريت لە جەوهەردا بريتيە لە پەيوەندی بەرژەوەندی ، يەکەم جار بالمرستۆنی سەرۆك وەزيرانی بريتانی ووتی پەيوەندی بەشەری بەرژەوەنديە ،ئەوی تر هەموی وەختيە(بەريتانيا دۆستی هەميشەی ودوژمنی هەميشەيی نيە بەرژەوەندی هەميشەی هەيە)[1009]، ئەوە بوويتە بنچينەی پەيوەندی نيو دەولەتی ئيستاشەوە،ئەوەش بە ياسای ( ياسای نەفامی) هەژماردەکرێت، تەنانەت براوە بەهيز (الغالب ) و ماف وهەق پێکوە بەستراوە ، ئەوەش رەهەندی نەفامی تيدايە ،بەلام ئەو نەفاميە تەنيا لەسياسەتی دەولی و خەلکی عەلمانی نيە ،ئەوەتا بەشيکی زۆری فقهی ئاينيش پالپشتی ئەو ريسايەی (الغالب هو الحق)دەکات وبەوە پيوەری هەلويستی شەرعی لەساغ کردنەوەی کيشەکانی حوکم (لەنيو ميژووی ئيسلاميش) ،کەچی ئەوە دژی دەقە دژی ياسای هەقە ، هەمولايەکيش لێی بەشدارن ،کەواتە ئيستا دەردەکەوێ دياری کردنی سنوری ياسای نەفامی وياسای هەق چەندە ئالۆزو زەحمەتە ،ئەو سنورە ناکەويتە سەر سنوری جوگرافی و نەژادی و(ئاينی ناسنامەيی) و..،بەلکو دەکەويتە سەر ناسنامەی کردار وەك(پراکتيکی) ولە ڕووی تيۆريشەوە دەکەويتە سەر (ڕاستی و دادگەری و پەيامی راستەقينە)

---

[1007] موسوعة التاريخ الأسلام ج1 ص53

[1008] قانون الشعوب ص43

[1009] Donald Kegan-Original of War and the preservation of peace p144

،بەرامبەر یاسای بەشەری بەهەمو چین وتویژو نەژادونەتەوەو هەمو ئەو فەرهەنگ وشارستانیەش کە بەرپا کراوە .

جاران لە یۆنانی کۆن بە یاسای رۆمانی دەوترا یاسای مەدەنی ئەگەر لەشارەکان بوایە، ئەگەر هەمان یاسا لە دەرەوەی شارو گوندەکان بوایە پێی دەووترا (یاسای میلەتان-قانون الشعوب)[1010]،مەبەستیش لە (شعوب) نەفامی بوەیان جاریش وایە بەوانە وتراوەفیزیۆکرات کە یاسای سروشتی دەکەنە بنچینە دادگەری کۆمەلایەتیش و دژی دەستتیوەردانی دەولەتن لە باری سروشتی کۆمەلگە . ئەو جۆرە سنورە بۆ دوو جۆرە یاسایە لە ڕوانگەیەکی چینایەتیو ئەرستۆکراسی دیاری کراوە ،کە دوایش چەمکی شارستانی لەسەر ئەو بنچینەیە گوزارش کرا، هەیە بە جۆریکی تر دەست نیشانی ئەو سنورە دەکات،

کەواتەلە هەموباریك بوونی یاسا لەنەبوونی باشترەێت باشترە لەنەبوونی ،لەوەوە تاڕادەیەك یاسای نەفامی و یاسای هەق شیوەیەك لە نسبی وەردەگرێت ،هەتا ئەوانەی بەناوی ئاینیش حوکم دەکەن ،رەهەندی نەفامی تیدایە ، وەك ئەو فەرمودەی پیغمبەر بەرامبەر (ابوذر الغفاری) ووتی:( یا أبا ذر! أعيرته بأمه؟ إنك امرؤٌ فيك جاهلية) ، کەواتە مادام لە فکری ئەبوزەڕ مرۆڤی بە پیست (بە ڕەش وسپی) زەد کرد ،بە یاسایەکی نەفامی وەسف کرد ، بەلام نەی ووت تۆ نەفامی ووتی (فيك الجاهليه) ،واتە میژووی ئیسلام پریەتی لەو ڕەهەندە، دوای هەر لەو رەهەندی نەفامیەوە بەو نەووتراوە (موالی)کە موسولمانی غەیرە عرب بووینە ، زیاتر لەوەش ووتراوە(شعوبی) بەوانەی عربیان بەسەر عەجم فەزل نەکردوە،یان وەك دمحمد عمارە دەلیّ ئەوانەی ویستیان ئیسلام وەرگرن بیّ عروبە[1011] ، دوایش ئەو ڕەهەندە نەفامیە پەرەی سەندو هەمو ئەو زانایانەشی گرتەوە کە عرب بەسەر میلەتانی تر فەزل ناکەن ، لەکاردانەوەی ئەو بۆچوونانەی (فەزلی عرب) لە زۆر لایەن فەزلی

---

[1010] الموسوعه العربيه ج15ص188 .

[1011] معركة المصطلحات ص213 ..

میلەتانی تر بەسەر عرب نوسرایەوە وەك كاردانەوەی نەفامی بەنەفامی ، هەر لە ئەندەلوس تا دەگاتە عەجەمستان ،لەوانە :كتێبی (انتصاف العجم من العرب-حمیدالبختكان) (فضل العجم علی العرب وافتخارها) (مفاخر العجم) ..بەلام ئەوكتێبانەلە نیو براون تەنها لەلایەن جاحزوابن قتیبە (عیون الاخبار) هەندیكی نەقل كردوون به پێی (الموسوعە العربیە) بۆیە لەناوچوون چونكە هۆكاری پەرتەوازەی ئومەی ئیسلامی بوە[1012].

هەمو ئەوانە لە كارەكەو كاردانەوەكەو هەلوەستەی (الموسوعە العربیە) وخودی ئەو نوسینەی ئیمەش ڕەهەندی نەفامی تیدایە ،بەلام هەموی وەك یەك نین ،هەندیكی تۆخ ترە لەهەندیكی ،هەندیكی لەڕەهەند تیدەپەڕێ دەبیتە یاسای نەفامی ، كەواتەدۆمەینی نەفامی زۆر فراوانترە لە دۆمەینی(هەق) ،بەشێك زیاد لەوە ڕەت دەبن ،پێیان وایە بیجگە لە ڕاستی باقیەكەی تر نەفامیە،،سیدقەتب تاڕادەیەك بەلای ئەو بۆچوونەیە لەوسەردەمە،ئەوەی پالپشتی ئەوە دەكات ئایەتی (فماذا بعد الحق الا الضلال) ووتەكەی ئیمامی عمرەكە دەلێ (لایعرف من الاسلام مالم یعرف الجاهلیە) هەروەهاش لە(كتاب المواقف-ئەو كتیبەی نەفیریە دەلێ لای خودای گەورە بۆم هاتوە ) دەلێت: چەندە لە نەفامی شارەزا بیت ئەوەندە بە هیزدەبیت لە زانستا ،دەقەكە:(..وقال لی كلما قویت فی الجهل قویت فی العلم)[1013]، بەلام ڕاستی ئەگەر تەسكیش بیت زۆر پتەوە، نەفامی چەندە فراوان بیت لەرزۆكە، نەفامی زۆر تۆخ ئەوەیە كە ئامۆژگاری وچاكسازیش هەلناگرێ ئەو كاتی ( وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما-الفرقان 63 .

ئیستا هەندێ سەرەنجامی پیچەوانەمان بۆ دەردەكەوێ ، ڕەنگە نەتوانین (جگە لە حوكمی پیغمبەران لەژیر سایەی پەیام) باقی حوكمەكانی تر بە یاسای هەق لە قەلەم بدەین ،بەلكو رەهەندی یاسای

---

[1012] الموسوعة العربية ج11ص716-717 .

[1013] كتاب المواقف والمخاطبات –محمدبن اكل النفيرى –الموقف رقم70 ص125

نەفامی تیدایە ،بەدبەختانە ئەو جۆرە حوکمەش بە (سیۆکراتی)وەسف کراوە (ئەگەر پیناسی سیۆکراتی باو وەرگرین) ، لە میژووشدا یاسای نەفامی وەبەر هەمولایەك کەوتوە ،ناتوانین بلیین جیهانی مسیحی یاسای هەق بوەو ئەوەی یەهودی نەفامی ، یان جیهانی ئیسلامی یاسای هەق بوەو رۆژئاوا نەفامی ،وانیە ،بەلام ریژەیان جیاوازی هەیە ، بۆ بارو دۆخی ئیستاش وەك چۆن زانایەك رۆژئاوای بینی ووتبووی لیرە ئیسلام دەبینم بەلام موسولمان نابینم،بەلام لای خۆمان موسولمان دەبینم وئیسلام نابینم ئاواش سەروەری یاساو مافی هاوولاتی بوون مافە مەدەنیەکانیان زۆر لە جیهانی ئیسلامی پیشکەوتووترە ، رەهەندی نەفامیەکەی لە جیهانی ئیسلامی کەمترە ، کەواتەدووبارە ریسایەکەی ئیبن تاوس لەو زاراوەش پاسادان دەبیٚ کەووتویەتی(الکافر العادل خیرمن المسلم الجائر).

**رِوانگەی مەدرەسەکان:** دەتوانین (یاسای نەفامی)لە رِوانگەی مەدرەسەکان زۆر کورت بکەینەوە لەوەی کە هیچ لایەك بەزاراوەیەکی ئەرینی نازانی ، تارِادەیەك بەمولکی ئاینی دەزانن بۆیە کەمتر ئەو زاراوەیە بەکاردەهێنن بەلام هەریەکەو هەلویست ورِوانگەیەکی بۆ هەیە ،ئاین پێی وایە هەمو یاسایەك لە دەق نەهاتبیت نەفامیە (افحکم الجاهلیە یبغون ..)، مارکسیەکان پێیان وایە جگە لە پەیامی پرۆلیتاریا ئەوەی تر هەموی نەفامیە هەتا یاسا خودی خۆشی نەفامیە ،لەو بارەیەوە لینین دەلیٚ : (پرۆلیتاریا بەهیچ یاسایەك پابەند نابێت)، (مادام پرۆلیتاریا بەند نەبێت بەیاسا ئەوا لە سۆشیالیستیش یاسا نیە)، ،ئەو کاتە بەرِای (ئەمانۆیل کانت) ئازادی تاك هەرنامێنێت و دەلێت ئازادی رِاستەقینە ئەو کاتە دێتەدی کە کەس یەردەستی کەسێك نەبێت ، هەمولایەك یەکسان بن بۆ یەك یاسا[شمتریتر] ، هەرچی لیبرال دیموکراسیە پێی وایە سەردەمی ئاینی وحوکمی کنیسە وسیۆکراتی نەفامی بوە ،پیی وایە حوکمی ئاینی پەرتەوازەیی و تاریکی ونەفامیە ،دیموکراسی و سەروەری یاسا رِووناکی وعەقلانیە ، لەو بارەیەوە بەشیکی گرنگی ناشیۆنالیزمیەکانیش لە چوارچیوەی دابەشی عەلمانی وئاینی لایەنگیری عەلمانین ویاسای نەفامی دەدەنە پال حوکمی ئاینی (ئەو ئاینەی یارمەتی ناشیۆنالیزم نەدا) بەشیك لە ناشیۆنالیزمی عەرەبی(لەهەردوولای عەلمانی وئاینی) دژی ئەوەن بە عربی پیش ئیسلام بووتریٚ جاهلی (وەك لەسەروو لایەکی لیٚباس کرا)، دەلین جاهلی مانای همجی

---

[1014] فریدریك ئای هایك – الطریق الی الرق ص51 .

ونەخویندەوارو بیشارستانی نیە ،بەلکو مەبەستیان لە (امی) بەئاین نەك نەخویندەواری ، لەسەر ئەو بنچینەیە (قاموس حزب البعپ) پیی وایە ڕاستە دوو جۆر یاسا هەیە،بەلام بەپیچەوانەی ڕوانگەی ئاینی ئەو پێی وایە یەکیان ئاسمانیەو قەتیس ماوە لە (عبادات ومعاملات ) هەرچی (یاسای دانراوە) لای بەشەر هاتوەو سروشتیەو فراوانترە ویاسای ئاسمانیش جاروایە لەخۆ دەگری و لە دەستور سەرچاوە دەگری و پەریتەوە بۆ یاسای دەولی[1015] ، هەر لەتەنیشتی ئەو بۆچوونە لە (مفاهیم حزب التحریر) پیش ئەوەی گفت وگۆ لەبارەی پۆلین کردنی بکا پێی وایە یاسای نیودەولەتی هەرنیە مادام حکومەتیکی جیهانی نیە بتوانێ جیبەجێی بکا[1016]،وادیارە دان بە نەتەوە یەکگرتوەکانیش نانیت ئەو ڕۆلە ببینی . بەگشتی بە ڕای عەلمانی یاسای خوای لەلای یاسای بەشەری جێی بۆ دەکریتەوە ، یاسای بەشەری فراوان وئەوی تریش تەسك ..،لەوێ پێش رینسانس بە نەفامی وەسف دەکرێ، جاران لە ئەدەبیاتی عەلمانی نکولی لە یاسای ئاینی کراوە بەلام ئاینی میلیان پێپەسند بوو تا ئەو ڕادەیەی دەبوە فاکتەریکی یەکخستنی نەتەوە (میلەت-کۆمەلگە)،بەلام لەو دواییەو لەگەل سەرهەلدانی ڕابوونی ئاینی (بە مەزهەبیەتەوە) دەنگی ئەوە بەرز بۆوە کە ئاین نابیتە یەکگرتنی میلەت بەلکو دەبیتە پەرتەوازەی و کاری نەفامی ،بۆیە هەندێکیان مەرجی یەکخستن و(یەکیتی نیشتمانی)بە دوورخستنەوەی ئاین دەبەستنەوە[1017]،بەشیکی تریش بە پیچەوانەوەجیابوونەوەو سیستەمی عەلمانی و مافی چارەنوس بە نەفامی وەسف کراوە ، خەتی ئیخوانی عیراقی پێیان وابووە بانگیشەی دەولەتی کوردی نەفامیە ،جولانەوەی کورد دەمارگیریە و چونکەبانگێشەی ناشیونالیزمیە، جیاوازی خوازیە لە عێراق،لە بلاوکراوەی ژ:3 و12ی سالآنی 1963-1965ڕاشکاوانە تر باس لەوە دەکا دروست بوونی دەولّەتی کوردی دەولّەتی نەفامی وجیابوونەوەیە لە ئومە ،بۆیە حرامی کردوەو داوای لە ئیخوانی کوردو عەرەب کردوە یارمەتی نەدەن[1018]،لەکاتێکا

---

[1015] تعریفات ببعض المصطلحات –مکتب الثقافة والاعلام ص88 .

[1016] مفاهیم حزب التحریر ص155

[1017] قانون الشعوب ص39

[1018]الدکتوره ایمان عبدالکریم دباغ-الإخوان المسلمون فی العراق ص590 .

ناوچەکەو وولاتانی عەرەب خنکا بوون لەدەمارگیری و دەولەتی نەتەوەیی ،ئینجا عیراقیش دروست کراوی ئیستعماری بوە کەچی زاراوەی نەفامی بۆ کورد بەکارهاتوە .

(32)

## ئەنفال الانفال ANFAL

**ئەوانەش دەگریتەوە** (موالی ، شعوبی،علوج، علی کیمیاوی ، ڕەشبگیر،نورالدین پاشا،هیدریتچ،عتادخاص، ..)

سورەتێك لە قورئان هەیە بەناوی ئەنفال بەلام لێرە مەبەستە بنچینەییەکە ئەو نیە، مەبەست لەو پرۆژە سەربازیەیە کە حوکمەتی عێراق لە ساڵی 1987 دەستی پێ کرد بە سەرپەرشتی (علی حسن مجید- علی کیمیاوی) کە لەلایەن (صدام حسین) وحزبی بەعس دەسەڵاتی ڕەهای پێدرا ،لە ژێر دروشمی قەلاّ چۆی(تخریب) بە هەرئامرازێك، بەوشێوەیەلە 23ی شوباتی 1988 ەوە 8قۆناغی ئەنفال بەڕێوە چوو لەسەرانسەری کوردستان دژ بە شۆڕشی کورد وخەلکی مەدەنیش، تیّایدا هەموو دێیەکانی کوردستان وێران کردو سەروسامانیشی دابەش کرد، چەکی کیمیای بەکارهێنا بۆ قڕ کردنی ژیان لەو هەرێمانەدا، تائێستاش زیاتر لە 180تا 200000 لە خەڵکی سەرانسەری کوردستان لە ژن و منداڵ و پیرو مەدەنی و کاسبی ماڵی خۆی بزرە، ئەگەرچی ئاسەوارو گۆڕی بەکۆمەلیان دۆزراوە تەوەو هەندیکیان ناسنامە لەڕیی (DNA)دیاری کراوە بەلام بەگشتی بە بزر هەژماردەکرین، بەتێکڕای ئەوپرۆسەیە ووتراوە (ئەنفال) ،کە بەفەرمی لەلای حزبی بەعس ئەو ناوەی بۆ هەلبژێردراوە، ئیتر لەو کاتەوە تائێستا هەر پرۆسەیەکی سەربازی کە تالاّن و وێرانکردن و دەست درێژی بۆ سەر مەدەنی بە (ئەنفال)ناودەبرێت لەبەر بێ بەزەییانە ... ، بە هۆی ئەو تاوانانە سەرۆك کۆمار سەدام حسین وعلی حسن مجید وتاوان بارانی تر لە سیدارەدران ،ئەو کردەوەشیان بە جینۆساید پۆلین کرا ، سەرەڕای ئەوەش زانیاریەکی تەواو لەوتاوانبارانە وەرنەگیراوە بۆ ئەو بڕیارە بەرامبەر میلەتێك درا ؟کێ پالپشتی بوو ؟تەنانەت ئەو ئەفسەرە گەورەی ئەمریکی (جۆرج پیرۆ)کە رۆژانە لێکۆلینەوەی لە سەدام حسین دەکرد دەلێت سەدام خۆی لەبارەی وەلامی ئەنفال وکیمیایی هەلەبجە دەدزیەوە[1019].

---

[1019] بۆ ئەو سەربردەیەی گفت وگۆی جۆرج پیرۆو سەدام حسین بڕوانە:مجدی کامل- الحکام العرب فی مذکرات زعماء وقادة ورجال مخابرات العالم ص338.

لە نوسین ودادگاو بەیانی ریکخراوە نیو دەولەتیەکان کۆمەلیك پیناسی بۆکروە لەوانە (مجزرة رسمیة- مذابح-..)تیایدا توندوتیژیەکی بێبەزەییانە بەهۆی چەکی قەدەغەکراو بەکارهاتوە بیئەوەی جیاوازی بکریت لە نیوان مەدەنی وشەڕکەر، زیاتر هاوولاتی گرتەوە لە ژن ومندال وپیرو پەککەوتە .

بۆ ئەو جۆرە تاوانانە (کە لەدادگای عیراقی –پالپشت بە دانیشتنی رۆژی2008/4/14و دوای سەرۆکایەتی کۆمار پالپشت بەوەو بەمادەی 61ی دەستور بڕیارِی ژ:26ی سالی 2008ی دەرکرد)بە جینۆساید هەژمارکرا چەندین بڕیارِو ریکەوتنامەی نیودەولەتی دەرچوە دژ پێی ،ئەو جۆرە پرۆسەیە وەك تاوانی نیودەولەتی هەژمارکراوە بەپێی بڕیارِی ژ:260ی خولی(3)ی کۆمەلەی گشتی لە 9-12- 1948 لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان جارِدرا،بریاری تری لە 26تشرینی دوەم 1968، بریاری دادگای لاهای رۆژی 28ئایار 1951 وزۆری تر..

میژوەکی کۆمەلکوژی کورد: یەکەم جار نیە ئەو جۆرە کوشتن و بڕە دژ بە کورد دەکریّ لە میّژووی نویّ ، جاران ئەو هەلمەتانە کراوەتە سەر یەکتر ،ئەگەر زۆر توند بوایە زاراوەی ( تۆ بڕینەوە) بەکاردەهات لە ج16(بدایە و نهایە) باس لە بڕیارِێکی جینۆساید دەکا لەسەردەمی ئەمەوی دەرچوە دژ بەکورد:..(وفیها استعمل الحجاج علی فارس محمد بن القاسم الپقفی، وأمرہ بقتل الاکراد).،بەلام لەسەر بنچینەی رِەگەزی نەبوە ،بە شیّوەیەك بڕیارِ بدریّت رِەگەزیّك یان نەتەوەیەك قڕ بکریّت میّژووی دوور نیە ، ئیتحادیەکان لە سالی 1916 دژ بە ئەرمەن کردوویانە ، عەرەبیش دەلیّن جمال پاشای سەرکردەی عوسمانی لە بەرەی شام دژ بە ئەفسەر وتیّکۆشەرانی عەرەب کردوویە ، ناویشی بوە (جمال سەفاح –هەروەك چۆن علی حسن مجیدیش نازناوی بوە علی کیمیایی)بەلام سەرجەم لە سیدارە دراوەکان ژمارەیان لە 200 تیّناپەڕی ،مانای قڕ کردن وجینۆساید وەرناگریّ ،لە دوای دروست بوونی دەولەتی تورکیا بۆ یەکەم جار (ئەتا تورك)پیّ ی هەلّسا تەنها لە (خەربووت)400 لاوی لەسیّدارە داو، ئینجا تەکیەو مزگەوت و دیّیەکانی ویّرانکرد , نورالدین پاشای سەرکردەی سەربازی (ئەتاتورك)هەمان دەوری (علی حسن مجید)ی بینی, … و ژن و مندالّ و مالّیان تالاّن کردوون و

ئافرەتانیان بە تالابردووە ... هەتا گازی ژهراویش بەکار هاتوە ،هەروەك لە (ژ: 1083)ی ڕۆژنامەی (کورئۆغلۆ: kr- oglu)لە 13/ئەیلول/1938 لە ئەستەمبولّ بلاّوکرایەوە[1020] ...
لە عیراقیشدا ڕەنگە ئەوەندە بەس بێت هەلویستیکی خودی سەدام حسین بلاو بکەینەوە بزانرێ چ جۆرە ئایدیۆلۆجیایەکی هەلگرتوە دژ بە غەیرە عربی عیراق ،(اجتثوا من أرض العراق لكي لا يدنسوا تربة العراق ولا يدنسوا هواء العراق ولا يدنسوا الدم العراقي عندما تمتزج دماؤهم بدماء العراقيين بالتزاوج.. وهكذا أجتثتهم الثورة من الجذور لكي تنهيهم وتبقي العراقي الصافي الأبي الوطني الشريف الذي لا يقبل الذل مرفوع الجبين يبقى دائما وابدا....اطفالا ونساء..شيوخا ورجالا ومن اعمار أخرى.... )- صدام حسين....جريدة الثورة ١٩٨١/٢/١٦.

لەو سۆنگە ئایدیۆلۆجیە هۆلۆکۆستی لێهاتەدی ، لەژێر سایەی ئەو ڕێنماییە هەزاران خیزانی کوردی فەیلی بەناوی (ڕەچەلەك ئیرانی )دەرکران ،لەکاتیکا ئەوان پیش عرب لەو ناوچەیە بووینە وەك لەنامە وەلاّمەکەی ئەرستۆش بۆ ئەسکەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئیرانشار وعەجەم دەبا[1021]،دوایش ئەنفالی تەواوی کوردستان کرا، کە سەرەتاکەی لە تەعریب دەست پێدەکاو دوایش لە شۆڕشی ئەیلول و لەشۆڕشی نوێ بە فراوانی و ڕاشکاوی جێبەجێ کرا .

زەمینەی ئەنفال لە فکری عربی و ئاینیدا :حزبی بەعس حزبێکە لە ڕیزی فاشی و نازی بوو، ئایدۆلۆژیایەکی ئالۆزی ترسناکی هەبوو، پیکهاتبوو لە: شۆڤینیەتی نەتەوەگەری ( وەك لایەنی کۆمەلاّیەتی) ،ڕێبازی میکاڤیلی وەك (لایەنی سیاسی) ، دیکتاتۆری و تاکڕەوی وەك (لایەنی

[1020] بۆ زیاتر سەرنج بدە : دەرسیم لە مێژووی کوردستان ل186, 197, 212, 251, 326

[1021] ـ ئەوە نامەی ئەسکەندەرە کەلە بابل نوسیویەتی:... أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة .. ئەوەش نامە وەلاّمی ئەرستۆیە بۆ ئەسکەندەر کە هەردووکیان لەکتێبی (ابن مسكوية -تجارب الأمم ج1 ص23)وەرمانگرتوە: ... فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب...

دەسەڵاتی ئیداری)، سۆشیالیستی نیشتیمانی وەك ( لایەنی عەقیدەیی) ، تیڕوانینی خراپی بۆ غەیرە عرب گەیشتبوە ئاستی دەستورو منهجی حزب لەمادە (15) ی دەستوری حزبی بەعس واهاتوە:(الرابطة القومية هي الرابطة الوحيدة القائمة في الدولة العربية التي تكفل الانسجام بين المواطنين وانصهارهم في بوتقة واحدة، وتكافح سائر العصبيات المذهبية والطائفية والقبلية والعرقية والاقليمية). لەبارەی ئاینیش کە لە ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی حزبی بەعس هاتووە: (يعطوا الدعوة للوحدة العربية مضمونا ديمقراطيا اشتراكيا بعيداً عن صبغة الدينية)، کەچی ناوی سورەتیکی قورئانی کردۆتە گەورەترین تاوان و ئەنفالی پێکردوە، یەکەم جار ( كامل ساجت عزيز- قائد الفيلق الاول) لەگەل (سولتان هاشم) ئەو ناوەیان پیشنیار کردوە .

ئەو سورەتە لە بنەچەدابۆ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر تاوانبار هاتۆتە خوارەوە کە بەهیچ جۆرێك ڕێزی ڕێکەوتن پیاوەتی مرۆڤایەتیان نەدەزانی, لە کاتی هەرەتەنگانەکان لە ڕێکەوتن هەڵدەگەڕانەوە, لەپشت ڕا لە هێزی ئیسلامیان دەدا, هاوکاریان لەگەڵ دوژمن و داگیرکەرو زۆرداری جیهان دەکرد، هەروەك ئێستاش خێڵی وا هەیە لەکوردستان لەوەتی مەینەتی کورد دروست بوو هاوکاری هەر لەگەڵ دوژمن دەکاو پێشمەرگەیەکی نەبووە، ئیتر ئەو جۆرانە (وەك کاردانەوەی عەقلی سەربازی) شایەنی لە ڕەگ وریشە دەرکێشانن ، بەلام بە عەقلیکی ووردو ویژدان و(يا ايها الذين امنوا كونوا قوامين لله شهداء بالقسط ولا يجرمنكم شنان قوم على الا تعدلوا اعدلوا هو اقرب للتقوى واتقوا الله ان الله خبير بما تعملون ) ئەو سزایە قورسە دانابەزێ بۆ گیانی بەلام سزایەکە وەردەچەرخێ بۆ مال وسامانیان کە خۆشیان لەڕێی پەلامارو تالان کۆیان کردۆتەوە ، هەریەکە لە (ابو عبيد بن قاسم)لە کتێبی (الأموال), (ابن انجويه) لە کتێبی (اموال)بە وورد تر باسی ئەنفال دەکەن بە مانای (غنائم)کە جۆرێکی تایبەت لەو بێ بەڵێنانەی کە تەنها ئەو چارەیە شایەنی بووە کە لە پێشتر وانەبووە ،بۆ زیاتربڕوانە:( موسوع المصطلحات العلوم الاجتماعي والسياسي الفكر العربية والأسلامي) ، بەو شێوە

ئەنفال بۆ ئەو کۆمەڵە خەڵکە دابەزی[1022] ، بەڵام ئەوەی دژ بە کورد کرا بەناوی ئەنفال تەواو پێچەوانەیە ،چونکە:

1-حوکمەت هاتۆتە سەر خاکی کوردستان .

2-ئەو داگیرکەر بووە عەقیدەشی سوشیالیستی نەتەوەیی بووە هەمان عەقیدەی فاشی .

3-خەڵکی کوردستان پابەندتر بوونە بە ئاین.

4-خەڵکی کوردستان خاوەن بەڵێن و رێکەوتن و بەهاو گفت و بەزەیین .

5-هیزی حکومەت زیاتر لە ملیۆنیك لە هیزی تایبەتی‌و چەکی قورس و قەدەغەکراوو بەرامبەر 2000پیشمەرگەی بیپشت وپەناو بەچەکیکی سووك .

6-لەگەل زۆر جیاوازی تر

بۆیە ئەو ناوو دروشمە ئاینیانەی بەکارهات ئەوە بەکارهینان ودروست کردنی( پاساوی عقیدی‌و ئاینی )بوو بۆ ئەو پرۆسەیە ،بەکارهینانی ئاین دژ بە ئاینپەروەران لەلایەن بیئاینان .

بەگشتی بیرۆکەی ئەنفالی دژبەکورد لە سەرچاوەیەکی فقهی جێی دەبێتەوە ، لە چوارچیوەی تەقەلای بەرەسەن کردنی نەتەوەی عرب و ناونانی بە (امە العربیە) هەولی زۆر دراوە، لەهەمو هەولە سەرکەوتوەکان ئاینی بوە ،چونکە عربی پەتی (ئەعراب)کەمتر شارستانی هەبوە ،بۆیە ناتوانی ئەو پێگە میژووییە لە مەدرەسەکانی تری وەك لیبرالی وسۆشیالیستی و وعەلمانی ترجیێ بکاتەوە ،ناچارهەر ڕوویان لە ئاین کردۆتەوە ،هەر لە دەق تا دەگاتە فقهومیژوو وجوگرافیاو فەرهەنگ وزۆر لای تر ، ئەو تەقەلایە لەگەل قورئان سەرکەوتو نەبوو ،لەگەل فەرمودە بە هۆنینەوەو دەستکاری ئەنجامدرا،لەگەل فیقھ بە ئاسانی سەرکەوت، هۆنینەوەی (فەرموودە)ی وەك (حب العرب ایمان)،

---

[1022] ڕای تریش هەیە دەڵێ لە بنەچەدا ئەو سورەتە بۆ ئەو پرسە سەربازیانە دانەبەزیوەو ئەو سەربردەیەی بە ناوی ئەنفال لەگەل یەهودیەکان باس دەکرێ بەو شێوەی نەبوە ،بەلکو سورەتی ئەنفال مەبەسی داعاتی زەویە بۆ هەمو بەشەریەت نەك تالانی جەنگی .

(العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)[1023]، بەلای قورئان دانەچون چونکە :دەستکاری ناکریت و ئایەتەکانیش لە خزمەتی ناشیۆنالیزمی نین مەگەر پیچەوانە نەبن، بەلام زۆر بە ئاسانی ئەو تەقەلایە لەهەندێ مەزهەبی فقهی ئیسلامی سەرکەوتوو بوو، لای ئەو جۆرە فقهە سەقەتەی پێیوایە عەرەب(ئەفزەل)ترە لەکوردوعەجەم وتورك وخەلکی ترتا وای لێهاتوە ووتویانە دەبێ ئەو میلەتانە لە خزمەتیان بن،نابێ دژایەتیان بکەن ئەگەر عربیش داگیرکەریش بێت،نابێت کوردو عەجەم ژن لە عرب بهێنێ ، وای لیهاتوە بلێن ژنی عەرەب مارەیی لە عەجەم نایەت[1024]، لە کتێبی(مسبوك الذهب فی فضل العرب) بە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەکاهەندێ سەرمەزهەبی گەورە هەیە ئەو ڕایەیان هەیە لەوانە ئیمامی شافیعیش ، شیخ الإسلام ابن تیمیه دەلی : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهم)[1025]، زاراوە و چەمکی (موالی و شعوبی) و (علوج)ی لێ هاتەدی، بەو ڕەگەزپەرستیە بێ بنچینەیەبەشیکی زۆرلە میللەتانی لاواز لە شام وسەرووی ئەفریقا لە نێو عەرەب توانەوە ،بەڵام کورد نەتوایەوە[1026] .

هەرچەندە تەیاری عروبی هاوچەرخ لەبنەرەتا لەلایەن ڕۆژئاوا دروست کرا لەدژی عوسمانی بەڵام دوای بووبە ئایدۆلۆژیایەك رەگەکەی دەگێڕدریتەوە سەردەمی ئەمەوی[1027] و لەوێشەوە بۆ نەفامی پێش ئیسلام، ئەو شەپۆڵەش زۆر بەهێز و رەگ پتەوە، بۆیە عروبیەت کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی

---

[1023] بە پێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار (ئیمام جابربن زید –لە 93ی کۆچی مردوە ) فەرمودەکانی کۆکردۆتەوەو ناویشی نـراوە (دیوان جابر) بەلام ئاسەواری دیار نەماوە ، جۆرە فەرموودەی تر لەسەردەمی ئەمەوی نوسرایتەوە ،ئەویش لەلایەن عەباسیەکانەوە لادران وجۆریکی تر نوسرایتەوە ...هتد – بروانە :الاسلام بلامذاهب ص136،

[1024] المعرفة والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوي، المحقق: د أكرم ضياء العُمَري ج2 ص63

[1025] ابن تيمية-اقتضاء الصراطالمستقيم ج1ص419

[1026] **هەرچەندە دەقی زۆر ڕاشکاوانەی وەك (..ان اکرمکم عند الله أتقاکم)، (لا فچل لعربی علی أعجمی ولا أبیچ علی اسود..)،لەدوا وەسیەتی پێغمبەر(د خ) ئەوانەی ساغ کردەوە،کەچی ئەو جۆرە بانگێشە نەفامیەسەرکەوتوو بوە .**

[1027] لە (بدایە و نهایە ج16) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکا لەسەردەمی ئەمەوی دەرچوە دژ بەکورد:..وفيها استعمل الحجاج على فارس محمد بن القاسم الثقفي، وأمره بقتل الاكراد.

ئیسلامیەکانی عرەبیش هەیە بەهەرسێ تەیاری میانڕەوشلڕەوو و توندەکانیش، زۆربەی سەلبیاتەکانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان سەبارەت بە کێشەی کورد لەوە سەرچاوەوە دێت.

ئەو زمینە مێژوویەی سەروو بە هەردوو ئاڕستەی فقهی وسیاسی وای لە عەقلیەتی دەسەلاتداری عربی سەردەم بکا بە چاوێکی سووك تەماشای میلەتانی ژێر دەستەی خۆی بکا ،لە پیشدا میلەتانی عەرەب ئینجا میلەتانی تری غەیرە عەرەبی ژێر دەستیان، لەنێویشیاندا کورد ،بۆیە دەبینین لەو ڕۆژەی کە کورد لە لایەن یستعمارەوەخرایە ژێر دەستی عیراق ودەسەلاتی عەرەب ،ڕەفتاری زۆر دڕندەی لەگەل کراوە ، هەرەدواییەکەی ئەنفال بوە ،ناوی ئاینیە بەلام سەر بەکەلتوری عربیە نەك ئاینی ،زیاتر لەوەش سەدام حسین(سەرۆکی حزبیکی عروبی سۆشیالیستی) ئەوعەقلیەتە وزەمینە فکریەی عربی ئاشکرا کردوە لەوەلامی پرسیاریکی رۆژنامە نوسیکی میسری (لەبارەی حوکمی خوینرێژی)دەلیت:( ..أما كوننا دمويين بمعنى أننا نبادر الى قطع رأس كل من يخون هذا البلد...نعم كلما نكتشف أنه أقدم على ذلك نقطع رأسه وبلا رحمة وعلى رؤوس الأشهاد..وهذا ما كان يفعله أجدادنا في صدر الرسالة)[1028] .

بەدەر لە فەزای ئاینی باس لە قڕکردن وزۆر کوشتن وەك سەربەرزی بوە ،بۆیە زۆر جار لەکتیبە مێژووییەکان بە ئیسلامیەکانیشەوە باسی لەو جۆرە قڕکردنە کردوە ،لە (بدایە و نهایە ج16) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکا لەسەردەمی ئەمەوی دژ بەکورد :(..وفيها استعمل الحجاج على فارس محمد بن القاسم الپقفى، وأمرە بقتل الاكراد)، ڕوون دیارە بەپێی ئەو ڕێنماییە بێت وەك نەژادی کورد فەرمانی کوشتنی بۆدەرچوە ،ئەوەش بە جینۆساید هەژماردەکرێت .

ڕیشەی ئەنفال لە عیراق : لەو رۆژەی کوردستان بە عیراق لکیندراوە خۆشی لە خۆی نەبینیوە ، ڕاست تر لەوە لەوەتەی عیراق لە 1921 دروست بوە ،هەر لە قەیران ونائارامیدایە ئەو بارو دۆخە نا ئاساییە لە عیراق بەردەوام بوە بێ چارەسەریەکی ڕاستەقینە، هەربۆیەش ولاَتێکی نا ئارامو پڕ لە

---

[1028] صدام حسين حديث مع ناصر الدين النشاشيبي بتاريخ ١٩٨١/١/١٩ .

پشێوی لێ دروست بوە، سەرجەم زیاتر(36) ئینقلاب و ڕاپەرینی ئاشکراکراوە[1029]،تا ئیستاش مەرجە یاساییەکانی (دەولەت)ی پێ نەهاتۆتە دی بە پێی کۆنگرەی مونتیڤیدیۆ[1030]، واتە گەلی عیراق بوونی نیە(بەلکو فرە میلەت وپیکهاتەیە)و خودی دەولەت بوویتە لایەنیك لە ناکۆکیەکان نەك یەکخستنی ،لەو چوارچیوەیەش لەسەرەتاوە دژایەتی کوردستان کراوە،لەسالی 1963 بڕیاڕی قڕکردنی کورد دەرچوو، لە هەلمەتی یەکەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەکان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا بەپێی مادەی(2)ی (معاهده الدفاع المشترك بين دول الجامعه العربيه)کە لە 1950/4/13 مۆرکرابوو، لەوێشەوە بۆ هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە 1963/10/8بەسترا بوو[1031]، پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفڕۆکەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاکستانیش یارمەتی عێراقیان دا[1032]، تاگەیشتە قۆناغی مەترسی لە سالی 1964 عبدالسلام عارف(سەرۆك کۆماری ئەوسا) زانایەکی زۆری عربی کۆکردەوە شیخی ئەزهەریش هات بۆ فتوای ئەنفال وقڕکردنی کورد(یان ئەوەی پێی دەووترێ ڕەشبگێر) ،کۆنگرەیەکی ئیسلامی ڕێکخست لە بەغدا بۆ ئەوەی بە فتوا کورد بە یاخی (مارق) هەژمار بکەن بە پێی ئایەتی:(إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)،لەوەوە لە 5ی تەموزی 1965 فتوا بە ناوبانگەکەی (محسن الحكيم – گەورە مەرجەعی شیعەکان) دەرچوو دژ بەو

---

[1029] بروانە: 1-کتێبی (انقلابات فی العراق) 2- کتێبی: العراق ج2ص121 حتا بەتاتۆ- تیایدا ئەو ئینقلاب وراپەرین و یاخی بوونانەی سەر ژمێر کردوە .

[1030] بڕوانە دەقی مادەی (1)ی ڕێکەوتنامەی مونتیڤیدیۆی 1933 ئەوە بە ئینگلیزیەکەی :

**ARTICLE** 1
The state as a person of international law should possess the following qualifications: a ) a permanent population; b ) a defined territory; c ) government; and d) capacity to enter into relations with the other states.

[1031]ميثاق الوحدة العسكرية بين سوريا والعراق بغداد - دمشق 1963/10/8.... المادة 2: تشكيل مجلس دفاع اعلى مؤلف من القائد العام للقوات المسلحة للجيش الموحد، وثلاثة أعضاء من كل قطر يعينهم المجلس الوطني لقيادة الثورة. دەقی ئەو ڕێکەوتنە لە پاشکۆی ژ:3 لە کۆتایی کتیبی(ڕۆلی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد) بخوێنەوە .

[1032]ڕۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەیلول - ل168

کۆنگرەو دژ بە شەڕی کورد، ئەو کۆنگرەکە هەلوەشایەوە،ئەوە لە کاتیکا زۆربەی حزبە عەلمانیە عربەکان و تەیاری نەتەوەیی و دەزگا مدنی و رێکخراوە دیموکراسیەکان و جامعەی عربی و ... لەدژی کورد بەیانیان هەبووە و لایەنگری داگیرکردنو ئەو سزاتوندانەیان کردوە ، بەلام دەزگای ئاینیە سەربەخۆکان بەلایەن کەمەوە دژی کورد نەوەستان، جگە لە هەندێ مەلای دروستکراوی تابعی وەزارەتی ئەوقاف، لەسەر ئەرزی سەربازییش عبدالسلام عارف هیرش وپەلاماری بۆسەرکوردستان بە دروشمی( سەر بۆ ئێمە ومالٌ بۆ ئێوە) پیادەکرد،پەلامارەکانیان نیوەی کوردستانی باشوری گرتەوە، بە هەزاران خەلك گیراو کوژراو زیندانی کرا بە هۆی کورد بوونەوە .،تا نزیك هێلی 36 وشکستیان هێنا بەهۆی بەرگری هێزی پیشمەرگەو جەماوەر ، نابێ لەبیربکەین ئەوکاتی یەکێتی سۆڤیەت بەدەنگ هات دژی ئەوگەلەکۆمەکەی بۆسەر کوردستان ،وەزیری دەرەوەیان (ئەندرێ گرۆمیکۆ)لە 1963/7/4 سکالانامەیەکی ئارستەی عیراق وئیران وسوریاو تورکیا کرد(ناوی نان بەرەی ئیمپریالیزمی-سەنتۆ) ،

لة بةلطةنامةيةكى بةريتانى زانيارى ترلةوبارةى هاتوة دةقةكةى بلاودةكةينةوة : ( رقم 9E/3809تموز 1963الجلسة 36، المادة رقم1 في جدول الأعمال.

1- رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي إلى الأمم المتحدة

الأمم المتحدة، المجلس الاقتصادي والاجتماعي- للتداول العام رقم 9E/3809تموز 1963الجلسة 36، المادة رقم1 في جدول الأعمال.

**" سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية"**

الموضوع/ طلب إضافة فقرة جديدة الى جدول الأعمال

رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة الى رئيس المجلس الاقتصادي والاجتماعي

سعادة مستر ا. باتينو- الرئيس ،جلسة السادس والثلاثون من اجتماع المجلس الاقتصادي والاجتماعي

" استنادا الى بنود المادة62 من ميثاق الأمم المتحدة وقرار الجمعية العمومية رقم 96(1) والصادر في 11كانون الأول 1946 الخاص بجريمة حرب إبادة الجنس البشري ، تطالب ممثلية الاتحاد السوفيتي من المجلس إضافة فقرة مهمة وعاجلة في بنود الجلسة الحالية بعنوان " سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية"

نلحق بهذه الرسالة مذكرة توضيحية ومسودة قرار ستقدم للأمم المتحدة حول المسألة.

أكون شاكرا لكم لو قمتم بنشر هذه الرسالة وملحقاتها لتكون ضمن الوثائق الرسمية المنشورة للجلسة رقم 36 للمجلس الاقتصادي والاجتماعي للأمم المتحدة.

ايس .بورسيف – رئيس البعثة السوفيتية الى الجلسة رقم 36 للمجلس

مذكرة مقدمة من البعثة السوفيتية حول سياسة حرب الإبادة ضد الكرد من قبل حكومة الجمهورية العراقية

ترتكب الحكومة العراقية في هذه الأيام جريمة حرب إبادة الجنس البشري ضد الشعب الكردي في العراق.

تقوم الحكومة العراقية بارتكاب جريمة حرب الإبادة الشاملة ضد الشعب الكردي.في 6 حزيران بدأت الحكومة العراقية حملة عسكرية مكثفة ضد الكرد الذين يشكلون ربع سكان البلاد. تشمل حرب الإبادة التي تشنها الحكومة العراقية ضد الكرد في أراضي شاسعة من المنطقة الشمالية حيث تقوم الطائرات العسكرية والدبابات ووحدات من الدروع والمدافع بقصف عشوائي وشامل للمدنيين الأبرياء في القرى الكردية. ترتكب القوات الحكومية في حربها هذه المذابح الجماعية وسياسات قمعية ضد الكرد. كانت حصيلة الأيام الأولى من القصف الجوي هي تدمير 21 قرية وقتل 150 من الأطفال والنساء.

يتعرض الشعب الكردي لهذه الأعمال البربرية لا لذنب إلا لنضالهم المتواني من أجل تحقيق حقوقهم القومية المشروعة. تسند المطالب الكردية العادلة إلى مبدأ حق تقرير المصير للشعوب وحق جميع الشعوب بأن تحترم حقوقهم وأمانيهم القومية وتعترف بها.

حاول الشعب الكردي ولا يزال تحقيق أهدافه القومية بطرق سلمسة وأجرت لهذا الغرض مفاوضات مع الحكومة العراقية. إضافة الى ذلك ، لا تشكل المطالب الكردية مطالب انفصالية وإنهم يريدون فقط الحكم الذاتي ضمن الجمهورية العراقية.

وقف الشعب الكردي في السابق ولا يزال مع الشعب العربي في الكفاح ضد السياسات الامبريالية القمعية لتحقيق الاستقلال الوطني. بعد أن ربط الكرد مستقبلهم بالعرب شاركوا مشاركة فعالة في ثورة تموز 1958 لإسقاط النظام الرجعي في بغداد.

ولكن رغم ذلك ، ففي سعيه لتثبيت دكتاتوريته قام عبدالكريم قاسم خلال 18 الأشهر الماضية بشن حملة عسكرية لقمع الحركة الكردية بقوة السلاح. وكنتيجة للقصف الجوي التي تقوم بها القوات الحكومية للقرى الكردية قتل لحد الان 3000 شخص ونزوح 120 ألف من قراهم المدمرة. وفي نفس الفترة دمرت القوات الحكومية 150 قرية ومدنيتين صغيرتين كإجراءات عقابية ضد الكرد.

تسير الحكومة الحالية على خطى الحكومة السابقة. رغم أن الحكومة الحالية أدانت سياسة الحكومة السابقة تجاه الكرد وتعهدت بحل المسألة بطرق سلمية و الاعتراف بالحقوق القومية للكرد، الا أنها عادت بعد فترة من المفاوضات مع قيادة الحركة الكردية لرفض أبسط الحقوق القومية الكردية. يبدو أن الحكومة الحالية لم تدخل المفاوضات بحسن النية . استعملت الحكومة المفاوضات مع قادة الحركة الكردية لكسب الوقت لتعزيز سلطته وإرسال المزيد من القوات إلى المنطقة الكردية.

إن هذه السياسة الخادعة هي نموذج للسياسات التي تتبعها الحكومة تجاه الكرد. إن المذابح الدموية التي ترتكبها الحكومة حاليا ضد الكرد هي سياسة حرب إبادة الجنس البشري : فهي سياسة تهدف على القضاء الكامل و المنظم على فصيلة اثنية من الشعب العراقي .لهذا السبب يلفت بعثة الاتحاد السوفيتي نظر المجلس إلى بنود المادة62 من ميثاق الأمم المتحدة وقرار الجمعية العمومية رقم 96(1) والصادر في 11كانون الأول 1946 الخاص بجريمة حرب إبادة الجنس البشري .تشكل السياسة الحكومية تجاه الكرد حرب إبادة للجنس البشري وخرقا للقانون الدولي وروح ميثاق الأمم المتحدة ويجب أن تحض بأهتمام دولي. كما نلفت نظر المجلس إلى قرار الجمعية العمومية الصادر في عام 1948 والخاص باتفاقية حضر إبادة العنصر البشري واعتبارها جريمة تستوجب العقوبة لمرتكبيها. فبما أن الحكومة العراقية وقعت مع 73 دولة أخرى على الاتفاقية المذكورة ، فانها في اختراق واضح لبنود هذه الاتفاقية بارتكابها حرب إبادة ضد الكرد.

"تنص الاتفاقية لحضر حرب الابادة على حق الدول الموقعة عليها أن تطالب المنظمات المعنية التابعة للأمم المتحدة لأتخاذ الاجراء المناسب لوقف ومعاقبة جريمة حرب ضد الطرف الذي يقوم بخرق بنود الاتفاقية ". علما أن الجمعية العمومية هي الطرف الراعي للاتفاقية المذكورة والتي تبنتها المجلس الاقتصادي والاجتماعي داخل الأمم المتحدة.

كما تلفت بعثة الاتحاد السوفيتي نظركم إلى كون أحد أهداف المجلس الاقتصادي والاجتماعي في الأمم المتحدة واستنادا إلى ميثاق الأمم المتحدة هو تقديم التوصيات الخاصة بتحسين واحترام حقوق الإنسان والحريات الأساسية.

لهذا لا يستطيع المجلس الاقتصادي والاجتماعي تجاهل ما تجري في كردستان العراق. إن المجلس مدعوة إلى إدانة أعمال الحكومية العراقية وتطالبها بوقف حرب الإبادة الشنيعة الجارية هناك.

تؤكد البعثة السوفيتية بأن القضية لم تعد مسألة داخلية عراقية وإنما قضية دولية تحكمها مجموعة من الاتفاقيات الدولية التي وافقت عليها الأمم المتحدة. لذلك تلح البعثة السوفيتية بأن حرب الإبادة الشاملة ضد الكرد مسألة يجب أن تدرج في جدول أعمال المجلس الاقتصادي والاجتماعي.

لذلك تقدم البعثة السوفيتية مسودة قرار ملحق بهذه المذكرة للنظر إليها بهذا الصدد.

المجلس الاقتصادي والاجتماعي للأمم المتحدة

الجلسة السادسة والثلاثون

## مسودة قرار مقدمة من البعثة السوفيتية حول سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل حكومة الجمهورية العراقية

المجلس الاقتصادي والاجتماعي –الأمم المتحدة

تنظر الحكومة السوفيتية بقلق بالغ إلى قيام حكومة الجمهورية العراقية بشن حملة عسكرية ضد الكرد في شمال العراق .وبما أن هذه الحرب حرب شاملة وتستهدف وجود الكرد وأنه بطبيعته حرب إبادة، فانها تدين وبشدة هذه الاجراءات التي تقوم بها الحكومة العراقية والتي تعد خرقا واضحا لبنود المادة62 من ميثاق الأمم المتحدة وقرار الجمعية العمومية رقم 96(1) والصادر في 11كانون الأول 1946 الخاص بجريمة حرب إبادة الجنس البشري والمباديء الإنسانية العامة والاعراف الدولية، وبما أن العمليات العسكرية الجارية ضد الكرد تعتبر خرقا لقرار الجمعية العمومية الصادر في عام 1948 والخاص باتفاقية حضر إبادة العنصر البشري واعتبارها جريمة تستوجب العقوبة وإن العراق من إحدى الدول الموقعة على تلك الاتفاقية ، تطلب وبإلحاح من حكومة الجمهورية العراقية الوقف الفوري لجميع العمليات العسكرية ضد الشعب الكردي.

**جواب العراق**

مجلس الأمن –الأمم المتحدة – التداول العام/ - 10s/5346–تموز–1963

رسالة من مندوب العراق الدائم في الأمم المتحدة إلى رئيس مجلس الأمن ،10تموز 1963

إشارة إلى الوثيقة رقم S/ 5345 المؤرخ 9 تموز والتي تحتوي على رسالة معنونة إلى رئيس مجلس الأمن الدولي من المندوب الدائم للاتحاد السوفيتي في المجلس ، يشرفني ،وبتوجيهات من حكومتي ، أن أدلي التصريحات التالية حول المسالة :

إ حكومة الجمهورية العراقية تستنكر وبكل شدة التدخل السافر للحكومة السوفيتية في الشؤون الداخلية العراقية. في الحقيقة إن التصريحات الأخيرة الصادرة من الحكومة السوفيتية تعتبر خرقا صريحا لمبدأ مهم من ميثاق الأمم وهو عدم التدخل في الشؤون الداخلية للدول الأعضاء ، والتي سبق وأن وعد الاتحاد السوفيتي باحترامه وتشدق به في عدة مناسبات.

**إن الادعاء بوجود حرب إبادة ضد الكرد في الشمال لا أساس له على الاطلاق.تشن العمليات العسكرية في منطقة محدودة  وموجهة أساسا ضد زمرة من الخونة من الخارجيين على القانون والمدعومين من الخارج لتمزيق وحدة العراق أرضا وشعبا.**

**كما أن الأدعاء السوفيتي باشتراك قوات غير عراقية في العمليات العسكرية ضد الكرد في شمال العراق لا أساس له من الصحة اطلاقا ولذلك نرفض الادعاء السوفيتي باشتراك القوات والطائرات السورية في شمال العراق. إن التدخل الأجنبي الوحيد في الشؤون العراقية هو التدخل الروسي ممثلة بجلبها مسألة داخلية عراقية بحتة أمام منظمات الأمم المتحدة. إضافة إلى ذلك نرى في الآونة الأخيرة قيام وسائل الإعلام السوفيتية والدول الاشتراكية الحليفة بتحريض المتمردين الخونة بحمل السلاح ضد الحكومة التي سبق وأن عترفت بها.**

**إن التدخل السوفيتي  في الشؤون العراقية كما يجسده رسالة مندوبه الدائم للأمم المتحدة هو تهديد صريح لاستقلال ووحدة أراضي العراق .وإن استمرار التدخل السوفيتي هذا رغم تعبير العراق عن رغبتها لتمتين أواصر الصداقة مع الاتحاد السوفيتي يسبب الكثير من القلق والاستهجان في الأوساط العربية التي تلقت نبأ هذا االموقف العدائي بكثير من الاستغراب .كما يشكل هذا التدخل تهديدا خطيرا للسلام والأمن الدوليين. لذلك نأمل أن تقوم الاتحاد السوفيتي بالوقف الفوري لهذا التدخل في الشؤون العراقية ويحترم بنود ميثاق الأمم المتحدة التي تنص  الحفاظ على وحدة أراضي و السيادة الداخلية للدول الأعضاء.**

**المخلص**

**توقيع:عدنان الباججي–**

**مندوب العراق الدائم في الامم المتحدة**

شان بەشانی سەربازی واترسناك هەڵمەتی فەرهەنگی وسیاسی و دەستوری بۆسەر كوردستان بەردەوام بوە ،لەهەمویان ترسناك تر پرۆسەی تەعریب كە لە لە خوارووی كوردستان، یەكەم هەنگاو لەوە دەست پێدەكات كە ناوچەیەكی گەورە(ئەوەی ئیستا پێی دەڵێن ناوچە دابڕێناوەان)جیاكرایەوە پیتی (B)ی پێدراله سایكس پیكۆی 1916، تاگەیشتە شێوەی فەرمی لە 1919بە فەرمی (كاپتن ستیڤان لۆنكرینگ-جێگری حاكمی كەركوك) بڕیارپیداكەركوك لە ژێر دەسەڵاتی كورد دەربهێنرێت[1033]، دوای ئەوەی بەریتانیا عێراقی دروست كرد ئینجا بیر لە تەعریبی خستە میشكی

[1033] سياسة البريطانية العظمى..ص100 .

دەسەلاتدارانی عیراقیش، ، یەکەم پرۆسەی تەعریب لە مێژووەوە وەرچەرخا بۆ جوگرافیا لەلایەن بەریتانیا کرا ویستی شێوازێکی عەرەبی بداتە ویلایەتی موسڵ لەکاتی کێشەکەی ئەو ویلایەتە لە 1923- 1925 ، بە تایبەتی ناوچەکانی کەرکوك تا موسڵ، پرۆسەی تەعریب بەناڕاستەوخۆدەستی پێکرد لە حکومەتی (یاسین هاشمی)یەوە[شممبرة] تا 1963، لەدوای ئینقلابی حزبی بەعس لە 1963 و 1968 بە ڕاستەوخۆ و بەرنامەی ڕێژی دەستی پێکرد، رۆژبەرۆژ خراتر بوە ، لە نێوان هەردووئاماری 1957 و1977 عەرەب لە کەرکوك (وەك نمونە) 28, 2٪بەرز بۆوە بۆ44,4 ٪، هەرچی کوردە ڕێژەی کەم بۆوەلە (48,3 ٪) بۆ(37,6 ٪) ، بەردەوامیش توومەتی زایۆنی وئیسرائیلی دوەم و کریگرتەی ئیستعمارو دوژمنی عرب و بلاوکرایتەوە، لەسەر ئاستی میلیش ئەو زەمینە سازابوو ڕایەکی گشتی بەهۆی (گوایە) پەیوەندی کوردو ئیسرائیل ئیران ...وای لێهاتوە زۆربەی نوکتەکانی خۆشیان خستبوە ئەستۆی کورد ..ڕێك دژی ئەو ئایەتە بوون(یا ایها الذین امنوا لا یسخر قوم من قوم عسی ان یکونوا خیرا منهم ولا نساء من نساء عسی ان یکن خیرا منهن ولا تلمزوا انفسکم ولا تنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الایمان ومن لم یتب فاولئك هم الظالمون ) هەروەك چۆن( ئەوان تسخرەکەیان دەکرد) زاراوەی (موالی و شعوبی) و (علوج)ی لێ هاتەدی، ئەو دوو زاراوە رەگەزپەرستیە وەك زارەاوەکانی تری (بەربەری لەنێو رۆم )و(ئەسنی لەنێو مەسیحی) و(جویم لەنێو یەهودی)و(شودراومەنبوز لەنێو هندۆسی ) و(مۆر لەناو لاتینیەکان)....و(بێگانە لەنێو خێلەکیەکان) مانای دەدا،، وایان پیشان دا لەمیژووی دوورو نزیك کورد خراپەیەکی زۆریان بۆ عرب بوویت ،یان بۆ ئاینی ئیسلام وخەلافەتەکەی هەبوویت ،بۆیە گەلێ جارنوکتەو سەربردەی خەیالیشیان هۆنیبۆوە لەسەر ئاستی میلی بۆ دروست بوونی ڕق وقینە .

لەوەلامی ئەوانەو کۆمەلیك وەلامی تر نوسەرانی بەدەنگ هاتوون ،نمونەیەك لەو وەلامانە هەلدەبژێرین : (برایانی عرب وبرایانی موجاهد ئەگەر بە دوای ئەوانە دەگەڕێن کە خەلافەتی ئیسلامی ڕووخاند ئەوا تورکیاو سعودیە بووینە ، ئەوانەی فلستینیان دۆڕاند ئەوا باپیرانی ئوردن وعیراق وحیجاز بوون ،

---

[1034] بۆیەش بکرسدقی کورد بیری لە ئینقلاب کردو پەیرەوی کرد لە 1936 -بڕوانەیاداشتەکانی مەندوبی ئەلمانیا لەعیراق فریتز غروبـا لـە (العراق فی المذکرات الدبلوماسین الأجانب ) .

ئەدی ئەوان نەبوون لە پاداشی ئەو هەمو چاکەیەی بنەماڵەی (الشريف حسين بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە 1916 قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس رۆیشت، لەو پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی بە (وسام النصر) و (صليب الحرب مع النجل) خەڵات کرا ، ئەوانە لەسەردەمی خەلافەت مەلەفی خیانەتیان هەبوو کورد نەبوون ، ئەوانەبوون کە لەمانگی 1927/1ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسكريت) لیستێکی موچەی مانگانەی ئەمیروشێخ وکەسایەتی عەرەبی تێدا بڵاوکرایەوە،لەوانە (1 ـ ابن السعود 100.000 جنيه، 2 ـ ملك حسين ـ شريف مكة ـ 100.000 جنيه، 3 ـ فهد الهذال 140.000 ربية، السيد الأدريسي12.000 ليرة..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژیەی بۆ بەریتانیا دەیکەن ، لەدۆسیەکانی وەزارەتی دەرەوەی فرنسا بەلگەنامەیەك دۆزرایەوە بە ژ:3547 ی رۆژی 15/ 6/ 1936تیایدا کۆمەلێك سەرکردەی عربی ئەو وولاتە داوا لە فرنسادەکەن هەر لەسوریا بمێنێتەوە ، لەو ناوانەی تیای بوە ( سليمان الأسد ومحمد سليمان الأحمد ومحمود أغا جديد وعزيز أغا هواش وسليمان المرشد ومحمد بك جنيد ..) ،هەموی عرب بوون کوا یەك سەرکردەی کوردی تیا نەبوو ؟بنکەکانی سەربازی ئەمریکی ورۆژئاوایی لە کوردستان نیە ئیستا ئەوە لە وولاتانی کەنداوو عربیە ،ئەوەی لە ناتۆیە ئەوەتورکیایە کورد نیە ،ئەو وولاتانەی ریکەوتنیان لەگەل ئیسرائیل هەیە کورد نیە وولاتانی عربن ،ئەوانەی وا لەگەل ئەمریکا ریکدەکەون بەناوی سەحوە(لە عیراقی ئیستا) جاشایەتی دەکەن کورد نین سونەی عربن ، ئەوەی ئیستا لەگەل ئیسرائیل ئابلوقەی خستۆتە سەر غەزە ئەوە کوردنین ، لە کتیبی(الحكام العرب فی مذكرات مخابرات العالم) دەلیت پیش جەنگی (ايام الستە) سالی 1973 مەلیك حسین بە سواری کۆپتەرو بەتاقی تەنها لە عەمانەوە بەرەو تەلئەبیب میوانی گۆلدەمائیر دەبیت وهەمو نهینی شەڕەکەی میسرو سوریایان بۆ ئاشکرا دەکات ودەلیت لە 6ی ئۆکتۆبەر هیرشەکەیان دەست پیدەکەن ودەگەریتەوە عەمان [1035]، ئەی ئەوە کورد نەبوە یارمەتی برایانی عەرەبی داوەو قودسی بۆ رزگار کردن لەسەردەمی سەلاحەدین کە ئەو کاتی پیشوو تریش خیانەت دەکرا ،هاڕوونە ڕشید داوای یارمەتی لە شارلمان دەکرد دژ بە

---

[1035] مجدی كامل- الحكام العرب فی مذكرات زعماء وقادة ورجال مخابرات العالم ص136.

معارەزەکانی خۆی لە ئەندەلوس ، خۆ لەو دواییەش سولتان محمود دژ بە معارەزەکانی خۆی (محمدعلی پاشا لە میسرو میری سۆران لەکوردستان )داوای لە بالمرستۆنی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا کرد بەهانای بیت دوای داوای لە ڕوسیاش کرد[1036]، ئەوە محمدکوڕی عبدالوهاب وزانای تر بەهاریکاری بەریتانی فتوای ئەوەی داوە کە خەلافەتی عوسمانی کافرەو ئەوەی گومانی لەو کوفرەش هەبێت کافرە[1037]،لەلایەن تەیاری عروبیش دەسەلاتی عوسمانی بە ئیستعمار(استعمار الترکی) وەسف کراوە،جاریش وایە لەلایەن ئاینیەکانیشیانەوە[1038] ،ئەوە کورد نیە کاتی تورك(ئیتحادوتەرەقی ودوای کەمالی) پیلان لە خەلافەت دەکا کورد دیفاع دەکاو گەورە سەرکردەکانی (شیخ عبدالسلام وشیخ سعید) شەهید دەکرین ، لەوەدەمەی بەشێك لەبرایانی عرب خیانەت لە خەلافەت دەکا کیانە عربیەکان لەگەل بەریتانیا لە ژێرەوە ڕیکدەکەون : لەگەل(قواسمەکان) لە 6/فبرایر/1806، ، لە11 /ینایر/1820 لەگەل شیخەکانی(رأس الخیمة، ابوظبی، بحرین، عجمان، ام القیوین،..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە1892، لەگەل سعودیەش ریکەوتنی قەتیف..،دوای بە یاوەری (لۆرانس) هیرشیان کردە سەر خەلافەتی عوسمانی.. لەو کاتەیە شیخ محمود خەریکی سەرخستنی خەلافەت بوە لە خوارووی عیراق، لەو کاتەی سەرکردە عربەکان خەریکی سەودا بوون لەگەل ئیسرائیل و یارمەتیدەری بوون سەرۆکی شۆرشی ئەیلول لە 1967 شەری یەکلایەنی رادەگەیەنی بۆ ئەوەی سوپای عیراق بتوانی یارمەتی برای عربی بدات ، ئەدی ئەو هیرشە وا بەتوندیە چیە بۆ سەر کوردستان ؟ تەنها ئەوەیە ئیوە چ عەلمانی توندڕەو چ ئاینی توندڕەوکەوتونە ژێر کاریگەری تەیاری عروبی و دژایەتی میلەتیك دەکەن کە هیچ میلەتیکی تر لە جهاندا ئەوەندە چاکەی بۆ برایانی عرب بووبیت) .

لە ڕاستیدا ئەو توندیەی بەعس بەرامبەر کوردلە ئەنفال وکیمیاوی و تەعریب وتالان دەگمەن نیە ، ئەوانە خۆبەخۆشیان توندن، ئینتماکردن بۆ هەرحزبیکی تر (جگە لە حزبی بەعس)خیانەت

---

[1036] بۆ ئەو سەربردەیە بڕوانە : مانسفیلد – تاریخ الشرق الاوسط ص101

[1037] بروانە ئەو سەرچاوانە: مذکرات هامفر ص40-41 هەروەها (فتاوی الائمە النجدیەج3 ص64 ) هەروەها (مشاهیر علماء نجد ص86) .

[1038] بڕوانە : اسلام بلا مذاهب ص527 .

هەژمارکراوە ، بە پێی بڕیاڕی(مجلس قيادة الثورة) ژ: ١٣٥٧ ی سالی١٩٧١( يعاقب بالاعدام أي منتسب عسكري ينتمي الى جهة سياسية محضورة أو يمارس عملا سياسيا مضرا بحزب البعث) ، نوسراوی (ديوان وزاره الدفاع ژ:٢٥٤٢١ - ١٩٨٦/١١/٢٠) ویران کردنی تیکڕای گوندەکانی ژێر دەستی خاینان بەبەکارهینانی هەمو جۆرە چەکیك .

بەهەمان شێوەش کاتێ چوونە ناو کویت هەمان بەدکاریان ئەنجام دا ،بۆیە بڕیاڕی ئیدانەی نێودەولەتیان لەسەر دەرچوو ﴿قرار رقم : 677 صدر في 28 نوفمبر 1990:إدانة العراق بسبب المحاولات التي يقوم بها لتغيير التكوين الديموغرافي لسكان الكويت﴾.

<u>بەرەو ئەنفال:</u> لە ریکەوتنامەی جزائیری 1975 دەرکەوت کە لە ڕوانگەی حزبی بەعس ئاوو خاکی بە بیگانە بدرێ چاکترە لەوەی ئاشتیەکی هاوتا لەگەل کوردبکریت ، لە بەرامبەر پیدانی ئاوو وخاك بە ئیران بە سانای وای لیدەخویندریتەوە کە حزبی بەعس نیازی لەناوبردنی کوردی هەیە ، دەستی کرد بە چۆل کردنی کوردستان ودەرکردنی کوردی فەیلی و تەعریب کردنیکی مەترسیدار بەشیوەی فەرمی دەستی پیکرد،(مجلس قيادة الثورة)یاسای ژ:180 دەرکرد لە 1980/2/3 دوای لە ١٩٨٠/٤/١٠ "بە بڕیاڕی ژ: ٥١٨ سیستەمیکی داهینا بەناوی (تبعی ئیرانی) وئەوانەی لە پیدانی ناسنامە بیبەش کرد ،دەستکاری یاسای ناسنامەی عیراقیشی کە بە(قانون الجنسيه العراقى الاول المرقم ٤٢ فى عام ١٩٢٤) ناوزەد دەکری[1039] ،دەستی کرد بەدەرکردنی کوردی فەیلی ، لایەنگریکی بەعسی (فوئادمەتەر) لەکتیبی لەبارەی (ژیانی سەدام) " Saddam Hussain: the Man, the Cause and the Future" هەقی بەو پرۆسەداوەو دەلێ پیویست بوو وایان لیبکرێ و 60000 هاوولاتی بەدوو قۆناغ دەرکران ،هەندیکیش دەلین چەندین قۆناغ بوە دەگاتە سەدان هەزار، بەتایبەتی لە دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی ئیرانی لە 1979 ودروست بوونی کیشەو دوای هەلگیرسانی جەنگ لەنیوانیان لە 1980.

---

[1039] الفقرة الثالثة : كل من كان في اليوم السادس من أب ١٩٢٤ من الجنسية العثمانية وساكنا في العراق عادة تزول عنه الجنسية العثمانية ويعد حائزا على الجنسية العراقية ابتداء من التاريخ المذكور .

هەرچەندە عیراق شەڕی دژی ئیران هەلگیرساند بەلام پشتیوانی عربی وجیهانی زیاتر بۆ عیراق بوو ،چەك وتەقەمەنی یەكجار زۆری پیدرا،بەلام هەر تووشی شكست دەبوو ،ئینجا دەستی كرد بەبەكارهینانی چەكی قەدەغەكراوو،لەوانەش چەكی كیمیایی، بە پیی (الموسوعة السياسية الاذاعة) بیرۆكەی یەكەم بەكارهینانی چەكی كیمیاوی سەردەم لەلایەن زانای ئەلمانی (هاربەر)دێت ولە جەنگی جیهانی لە 22/ئیپریل/1915 بەكاری هینا [1040]،ئەوكاتی ئەلمانیاو لەو دواییەش حزبی بەعس دەستیان لە مەدەنیش نەدەپاراست، ئەو پشتیوانیە دەولیەبۆ عیراق وای لیكرد پرسی كورد وجەنگی ئیران یەكخا، دەستی بە كۆكوژی و ویران كردنی گوندەكان كرد ، وادیارە هەندێ لە موفەكیرە گەورەكانی كورد ئەو بارودۆخە تایبەتیەی بۆ عیراق هاتبوو قەبلیندرابوو ،زانیبیوان كە كورد دووچاری كارەسات دەبیتەوە ، وای لیكردن بكەونە دانوستان لەگەل حكومەتی عیراق بۆ رزگاركردنی كورد لەو پیلانە مەترسیدارە ، ئەوەبوو (ی ن ك) بە فەرمی لە 1983 دەرگای بێمەرجی بۆ دانوستان كردەوە،پیشووتریش لەجەنگی عیراق ئیران زیاتر یارمەتیدەری عیراق بوو (بە تایبەتی لەدوای 1982) ، پاساوەكەی ئەوەبوو ، مام جلال(سكرتیری —ی ن ك) جیا لەسەركردەكانی تری (پارتی ،سۆشیالیست،ئیسلامی..)زانیاری نیودەولەتی زۆرتایبەت و ووردی هەبوو پیش رووداني دەیزانی، لە 1983 كاتی مفاوەزاتەكە كرا بەشیك نارازی بوون بەو دانوستانە، وای كرد ئەو نهینیە بۆ نارازیەكان ئاشكرا بكاو ووتی : ئەگەر مفاوەزات نەكەین حكومەتی بەعس بەرنامەی لەبەر دەستدایە هەمو گوندەكانی كوردستان بە 8 قۆناغ تەفروتونا دەكاو چەكی زۆر كوشندەش بەكار دەهینی كەسیش لەسەرمان بەجواب نایە ،بەلام نەی ووت ناوی ئەو پرۆسەیە ئەنفالە ، دوای زانیاریەكەی ئەو راست دەرچوو لە سەرەتای 1988 دەستی پیكرد.

كەچی حزبی بەعس بەرنامەكەی ڕانەگرت، لە پرۆسەیەكدا لە سالی1983 نزیكەی 8000بارزانی بیسەروشوین كرد،ناچار (ی ن ك) دانوستانەكەی لە 1985/1/15 ڕاگرت،حكومەتیش دەستی كرد بەبەكارهینانی چەكی كیمیای دژ بە بزوتنەوەی كورد، بەناوی (العتاد الخاص) ،ئەو بەلگەنامانەی لەبەر دەستایە واپیدەچی یەكەم راویژ سەبارەت بەبەكارهینانی چەكی كیمیاوی نوسراویكی

---

[1040] الموسوعة السياسية الاذاعةص33

سەرۆكایەتی كۆماره به مۆری (حامدیوسف حمادی )به ژ: ٧ / ج٢ / ٨٠٨ / ك بەرواری ١٩٨٧/٣/١٢ هەلگرتوه دەقەكەی واهاتوه : أمر السید الرئیس القائد بأن تدرس مدیریتكم مع الأختصاصیین توجیه ضربة مباغتة (لقواعد حرس خمیني ضمن مقرات مخربي الفرع الأول لزمرة البارزاني ) بالعتاد الخاص وامكانیة تنفیذها بأي من الوسائل التالیة( القوة الجویة ، طیران الجیش ،المدفعیة ) .

دوای راویژو وەلامی نوسراوی (مدیریی استخبارات المرقم م١ / ش٣ / ق٢ / ٦٤١٤ فی ١٩٨٧/٣/١٨) فەرمانیكی كۆماری ژ: ٧/ ج٢ / ٨٧٧ / ك له بەرواری ١٩٨٧/٣/١٩ بۆ(مدیریه الاستخبارات العسكریه العامه ). بابەت/ استخدام العتاد الخاص ، واهاتوه (نشیركم للفقره (٢-أ وب ) من كتابكم المرقم م١ / ش٣ / ق٢ / ٦٤١٤ فی ١٩٨٧/٣/١٨. حصلت الموافقه على المقترحین الواردین فیها) ، دوای هەفتەیەك لەو تاوتوێیه لەلایەن (مدیریه استخبارات- بەمۆری صابر دوری)پیشنیاردەكرێ ڕووی یەكەم گورزی كیمیاوی بگۆڕن بۆ بارەگای خودی تالەبانی ئەویش له ڕێی نوسراوی ژ: ش٣ /ق٢ / ٦٨٨٥ فی ١٩٨٧/٣/٢٥ و ئەو شوینه ستراتیژیانه دیاری كران بریتی بوون له: بالیسان –توتمه-خەتی –شیخ وەسان) لەنیوان خلیفان وچوارقورنه. گورزی دوەم له(تكیه-بلكجار-سیوسنان)له قرداغ- جۆری (عتادخاص) كیمیاوی (زارین وخردل)... دوای كەم تر له هەفتەیەك سەرۆكایەتی كۆمار رازی دەبیت بەلیدانی ئەو شوینانەی دیاری كران ،به پێی فەرمانی سەرۆكایەتی (بابەت:استخدام العتاد الكیمیاوی" الخاص" ) به نوسراوی ژ: ٩٥٣ / ٩٦٥ / ك بەرواری ١٩٨٧/٣/٢٩، دوا بڕیاڕدەقی ئاخافتنیكی علی حسن مجید: (آني راح اضربهم..راح اضربهم كیمیاوي..واموتهم كلهم...شیریدون یكولون..الدولي...أنعل أبو الدولي لبو الیفزع من كل دول الله) .

دوای جێبەجێكراو كارەساتی به سەرخەلكی مەدەنی هێنا ، كەمتر وەبەر هیزی پیشمەرگە كەوت، لەوەش خراتر لێدانی هەلەبجەو كارەساته گەورەكه له 1988/3/16 ڕوویدا زیاتر له 5000شەهیدوو دوو ئەوەندەش بریندار ،هەروەك مەوسوعەی بریتانیش ئەو ژمارەیەی تۆماركردوه و دەلێ به فراوانیش كیمیایی بەكارهیناوه[1041]. ،ئەوانەبەشیك له هەلمەتی ئەنفاله .

---

[1041] Encyclopædia Britannica- Article:Alī Ḥasan al-Majīd

بۆ زیاتر لە بارەی بەکارهینانی چەکی کیمیایی بڕوانە : The modern dictionary of military terms *p700-706*

پرۆسەی ئەنفال: وادیارە ئەو تەقەلایانەی دەولەتی عیراقی بۆدەرچوونی فتوای ئاینی وڕەخساندنی باری دەولی لە سەردەمی (ملامستەفابارزانی)ی سەرکەوتوو نەبوو،بەلام لە دوای 1976 وسەردەمی سەرکردایەتی عەلمانی کوردو بەرزکردنەوەی دروشمی مارکسی دژ بەئاینی ، هەندێ لایەنی مارکسی لە کوردستان چاکتر یارمەتی عیراقی دا بۆ پەیڕەوی ئەنفال دژ بەکورد، فکرەی ئەو ئەنفالە بەشێکی ڕەسەنە لە عەقیدەی بەعسی(وەك لەسەروو باس کرا)،لەدوای شکستی شۆڕشی ئەیلول ولەدەوروبەری 1976 کوردی ئەو دیو وئەم دیوی سنوری دەستکردی عیراقی لەیەك دابڕی بە درێژایی 30کم ، بە دابەزاندنێکی بەکۆمەلەوە لە زێدی باب وباپیرانیان بۆ کۆمەلگە زۆرە ملێیەکان ،بێئەوەی تەقەیەك مابیت لە کوردستان، ئەو بەرنامەیە چەند جارێکی تر بە نیاز بوون جێبەجێی بکەن بەلام هەر جارە بارێکی جیهانی یان ئیقلیمی دەهاتە پێش ،تا لە سالی 1987 بە دواوە باری ئیقلیمی وجیهانی زۆر گونجاو لە مەترسی شکستی جەنگی عیراق ئیران دەرچوو دەستی بە بەرنامەی ئەنفال کرد .(صدام حسين) خۆی ئیشرافی سەر ئەو نەخشەیەی کرد ،یەکەم هەنگاوی مەترسیدار ، کۆبونەوەیەکی بالای هاوبەشی(مجلس قيادة الثورة) و(القيادة القطرية لحزب البعث العربي الأشتراكي )لە بەرواری ١٩٨٧/٣/١٨ بە ئامادە بوونی سەرۆکی ئەرکانی سوپای عیراق (نزار الخزرجى) وجیگرەکەی (حسين رشيد التكريتى) و(مدير الأستخبارات العسكرية- صابر الدوري) لە ژێر دروشمی (حسم نشاط المخربين) ، تیایدا بڕیاڕدرا کە على حسن مجيد بكريتە حاكمی موتلەقی کوردستان ، ئەوەش بوە بڕیاڕیکی (مجلس قيادة الثورة) بە ژ:١٦٠ لە١٩٨٧/٣/٢٩ دەقەکەی ئەوەیە:

أولا: يقوم الرفيق علي حسن المجيد، عضو القيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي، بتمثيل القيادة القطرية للحزب ومجلس قيادة الثورة في تنفيذ سياستهما في عموم المنطقة الشمالية وبضمنها منطقة كردستان للحكم الذاتي بهدف حماية الأمن والنظام وكفالة الاستقرار فيها وتطبيق قانون الحكم

الذاتي في المنطقة.

ثانيا:يتولى الرفيق عضو القيادة القطرية، لتحقيق أهداف هذا القرار صلاحية التقرير الملزم لجميع أجهزة الدولة المدنية والعسكرية والأمنية، وبوجه خاص الصلاحيات المنوطة بمجلس الأمن القومي ولجنة شؤون الشمال.

ثالثا:ترتبط الجهات التالية في عموم المنطقة الشمالية بالرفيق عضو القيادة القطرية وتلتزم بالقرارات والتوجيهات الصادرة عنه التي تكون واجبة التنفيذ بموجب هذا القرار.

١ . المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان للحكم الذاتي.

٢ . محافظو المحافظات ورؤساء الوحدات الادارية التابعون لوزارة الحكم المحلي.

٣ . أجهزة المخابرات وقوى الأمن الداخلي والاستخبارات العسكرية.

٤ . قيادات الجيش الشعبي.

رابعا: تلتزم القيادات العسكرية في المنطقة بأوامر الرفيق عضو القيادة القطرية بكل ما يتصل بـ"أولا" من هذا القرار".

ناوبراو (مسؤل مكتب تنظيم الشمال) و حاكمی موتلەقی کوردستانی وەرگرت و دروشمی (مكافحه التخريب يأى وسيله) بەرزکردەوە ، شان بەشانی ئەو بڕیارە چەند جارێك وەزیری ئەوقاف لە تەقەلآیەکاندا نەیتوانی ئەو فتوایە وەرگرێ نەیان توانی لە (مرجعی) شیعەی خواروو فتوا وەربگرن . ئەو جارە ڕوویان لە ناوەراستی (سونە)کردەوە ، (عزەت ئیبراهیم) خۆی سەرپەرشتی ئەو ئەرکە گرنگەی کرد و ئەویش نەیتوانی لە مامۆستایانی وەرگرێت تەنیا توانی ئەو فتوایە لە چەند مەلایەکی سوننی عەرەب کە تابعی ئەوقاف وبەعسی بوون لەگەڵ کەمایەتیەکی زۆر کە لە چەند شیخ و کولکە مەلایەکی بەرژەوەندی پەرست نەزانی کوردستان ئەو فتوایەی ئەنفالیان بۆ دان.

**قۆناغەکانی ئەنفال:** ئەوتاوانانەی سەروو ناویکی وای هەلنەگرتبوو ،مەگەر ناوی سەربازی دەماودەست ، لەدوای ئەو پرۆسە دڕندانە بەرگری کوردستان هەر بەردەوام بوو ، ئیتر هێرش وپەلاماری مەترسیدار بەناوی (ئەنفال) دەستی پیکرد ،زۆر ڕوون نیە یەکەم جار چۆن ئەو ناوە

هەلبژیردرا ،تەنها لە ئیفادەکانی سولتان هاشم-وەزیری بەرگری لەدادگای عیراقی ئاشکرای کرد کە خۆی و (کامل ساجت عزیز -قائد الفیلق الاول)ئەو ناوەیان داهێنا .

سەرجەم 8 قۆناغ بوولە مانگی 2 تامانگی 9ی خایاند، تیایدا چەکی کیمیای بەکارهات ،200هەزار لە سوپای عیراق بەشداری کرد بە چەکی تازەو کیمیاوی(عتادخاص) ، ئەوەش بەکورتی 8 قۆناغەکەیە:

قۆناغی یەکەم: لە1988/2/23 (هەندێکی تر دەلێن زووترلە 1988/2/6 دەست پێدەکا) ناوچەکانی سەرکردایەتی (ی ن ك)ی گرتەوە ،سەرگەلوو و 150گوندی تیدایە بە دۆلی جافایەتی بەناوبانگە ،دام ودەزگاکانی سەرکردایەتی (ی ن ك) لە(سەرگەلوو, – مولان – قمر خان – کانی تو – هلدن – چالاو – یاخان – جوخماخ –- قزلر —یاخسەمەر-بەرگەلوو -زیوە)بوون ، لە سالی 1982 فەرمانی چۆل کردنیان لەلای حکومەتی عیراقی بە بڕیاڕی (مەنزومەی ئیستخبارات ژ: ش3 ق3/قادسیەصدام/643ی رۆژی 1982/4/4)دەرچووبوو، هیزەکانی فەیلەقی (1) بەسەرکردایەتی (سولتان هاشم) فرقەکانی (بدر-قعقاع-معتصم- افواج خفیفە) بەشداری کرد، فەیلەقی (5)یش بەشداربوو سێ لیوای حرس جمهوریش بەشدار بوون ،هەموی بە سەرپەرشتیاری (عزەت دوری ) بوو ، نزیکەی مانگ ونیویکی خایاند لە جەنگ وبەرگری دوای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بە فەرمانی سەرۆك کۆمار ژ:7371ی رۆژی 1987/3/31بۆ (سەرۆکایەتی ئەرکان) ،لە 1988/3/18 کۆتایی هات بەگرتنی ئەو ناوچەیە،ئەوەی هەلات بەرەو سنوری ئیران ئەوانی تریش لە خەلکە مەدەنیەکان کۆکرانەوەو رەوانەی تۆبزاوە کران ولەویش نێرو مێ لێکجیاکرانەوە ئەوجا زانیان رۆژانی ڕەش بەڕاستی واچاوەڕێی کوردە،تەواوی ئەو گوندانەش ویران کران وئەوی بەکەلکیش هات تالان کران ،لە رۆژی دوای رۆژنامەی (الثورة)ئاوای وەسف کرد:

(أفتتاحیة جریدة الثورة - ١٩٨٨/٣/١٩ : أن قوات جحافل الدفاع الوطني الأول البطل وقوات بدر الباسلة وقوات القعقاع الشجاعة وقوات المعتصم الظافرة وافواج الدفاع الوطني المقتدرة قد نفذت أمس عملية (انفال)، حيث اندفعت قواتنا لمهاجمة مقر التمرد الذي يقوده الخائن جلال الطالباني العميل للنظام الأيراني ، عدو العرب والاكراد ،وذلك في منطقة سركلو وبركلو وزيوه والمناطق الجبلية

والوعرة ضمن محافظة السليمانية .. وفي الساعة الواحدة من ظهر أمس تمكنت قواتنا الباسلة من احتلال مقر التمرد والقاء القبض على أعداد من الضالين والخونة بعد أن قتل منهم من قتل وهرب منهم من هرب) هەر لەو رۆژەدا بروسکەیەکی فەرماندەی فەیلەقی (1) سولتان هاشم بۆ سەرۆك کۆمار(سەدام حسين)لە ١٩٨٨/٣/١٩ ئەوە دەقەکەیەتی :

( أزف إليكم انتصار القطعات المشاركة في عملية الأنفال على فلول بعض عملاء ايران حيث تم بعون الله تعالى تدمير مقرات المخربين في المناطق ( سركلو , بركلو , زيوة – مولان – قمر خان – كاني تو – هلدن – جالاو – ياخان – جوخماخ - ياغ سمر – قزلر ) والمناطق والمرتفعات المحيطة بها من قبل رجالك الشجعان أبناء القادسية من القطعات العسكرية والغيارى من أبناء شعبنا الكردي المتمثلة بمنتسيي أفواج الدفاع الوطني الذين آلوا على أنفسهم إلا أن يجتثوا هذه الحثالة التي تعاونت مع الأجنبي لتدنيس أرض الوطن حيث تم قتل أعداد منهم ومطاردة الاخرين الذين لاذوا بالفرار هاربين باتجاه أسيادهم وتم الاستيلاء على أجهزة الاذاعة للعملاء وأعداد من الأسلحة والمعدات والتجهيزات والعجلات .سيدي الرئيس القائد حفظكم الله لقد قاتل جنودكم الأبطال من منتسيي رجال المشاة والدروع والمدفعية وطيران الجيش والهندسة والصنوف الاخرى من منتسيي قيادة قوات جحفل الدفاع الوطني الأول وقيادة قوات بدر وقيادة قوات القعقاع وقيادة قوات المعتصم وبتعاون واسناد تام من قيادة الفيلق الأول البطل وقيادة الفيلق الخامس البطل وبتوجيه مباشر من السيد نائب القائد العام للقوات المسلحة والسيد رئيس أركان الجيش وأعضاء القيادة العامة للقوات المسلحة ومشاركة التنظيم الحزبي لفرع الرشيد العسكري .وفق الله الجميع لخدمة عراقنا الحبيب بقيادتكم الفذة ونعاهدكم على الاستمرار بالطرق على رؤوس هذه الفئة الضالة حتى تعود الى صوت الحق) .

قۆناغی دوەم : سێ رۆژ لە دوای سەرکەوتنیان لە قۆناغی یەکەم دوەمیان دەست پیکرد لە 22ی ئادار ،تایبەت بوو بە ناوچەکانی قەرەداغ و80 گوند ، یەکسەر بە چڕی سیوسێنان کیمیاوی باران کرا بە فەرمانی سەرۆك کۆمارو جیبەجێ کردنی علی حسن مجيد بە پیی نوسراوی ژ:965/953ی رۆژی 1987/3/29، دوای بە نوسراوی ژ:3656ی رۆژی 1987/4/5(رئاسە اركان-المكتب الخاص) رینماییراستەوخۆ درا بۆ جیبەجێ کردن، ئەو قۆناغە

زۆری نەبرد  لە 1988/4/1 سەرکەوتو بوو ، لە هەمان کات  بروسکەی علی حسن مجید بەناوی(مکتب تنظیم الشمال) ژ: ٤١٣ لە ١٩٨٨/٤/١٠هاتوە کە هەمو ئەو هاولاتیانەی لەو ناوچانە دادەبەزن بۆ شارەکان بگیرێن ورەوانەی گرتوخانە بکرێ ..تراجیدیای ئەنفال دەست پیدەکا ،دەقی بروسکەکە: ( ١-تحجز جميع العوائل التي تأتي الى المدن والمجمعات والتي تنزح من القرى المحذورة أمنياً.

٢- تنشط جميع الأجهزة الأمنية والحزبية والعسكرية واعلامنا باسمائهم فوراً وتتولى مديرية الأمن حجزهم. ) پیشوو تریش بەفەرمانی ژ:4008 لە رۆژی 1987/6/20 دەرچوو بوو هەمو گوندیکی بەدەر لە ژێر هیزی عیراقی بە تاوانی مەرگ هەژمارەو یەکسەر جیبەجی بکریت .

قۆناغی سییەم : ناوچەکانی  گەرمیان(رۆژهەلاتی کرکوکی – رێگای کرکوك وتووزو کرکوك چەچەمال وسەرووی کفری و کەلارو پیبازۆك و تادەگاتە نزیك چیای قەرەداغ ) نزیکەی 500 گوندی ، گرتەوە لە ١٩٨٨/٤/٧دەستی پیکرد ، لە ١٩٨٨/٤/٢٠کۆتایی هات، رۆژی ئەنفال خراوەتە ئەو نیوانە ،رۆژی 4/14ی هەمو سالیك چونکە وامەزەندە دەکری 25000کەس(لە ژن ومندال و پیرونیرومی) ئەنفال کران.

قۆناغی چوارەم:  تایبەت بوو بەدەشتی کۆیە(گۆپتەپە-بەستی شەنغە-عەسکەر-شوانایەتی-تەقتەق –ئاغجەلەر-دەشتی کۆیە  ) بە کیمیابارانی گۆپتەپە دەستی پیکردلە5/3 تا 5/15 کۆتایی هات ،

قۆناغی پیینجەم: ناوچەکانی خۆشناوەتی وگەرەوان وئاکۆ و هیران و.. پیشوو تر بەکیمیاوی لیدرابوو بە پیی نوسراوی (مديرية استخبارات –الشعبة الثالثة ش3 ق2) بۆ سەرۆکایەتی کۆماو رازی بوون بەبەکارهینانی (عتادخاص-کیمیاوی)  لە رۆژی 1987/4/6 بۆ بالیسان .

قۆناغیشەشەم تا هەشتەم :تایبەت بوو بەناوچەکانی بادینان لە 1988/8/26 تا9/6 بەردەوام بوو دژ بە 450تا 500 گوند ، شەڕی ئیران وەستا بوو وای کرد هەمو قورسایی بەرەو ئەو ناوچەیە بیت ،بەلام لە چاو ناوچەکانی تر زیاترین دەنگی دایەوە لەسەر ئاستی دەولی .

لە رۆژی 9/6 بە یەکجاری جاڕی سەرکەوتن وکۆتایی قۆناغەکانی ئەنفال لە بەیاننامەیەکی فەرمی عیراق دیت ، بەلام لە گفت وگۆیەکی علی حسن مجید رۆژی ١٩٨٨/٩/٤ بە کۆتایی ئەنفال و (تخریب) نیشان کرد.

<u>چارەنوسی گیراوە مەدەنیەکان:</u> لە ئاخافتنیکی علی حسن مجیدئاوا چارەنوسیان دیاری دەکا: (..عوائل المخربين..والكذا..والمدري ايش من القيادة العامة.. كتلهم جيبوليباها ..على راسي... لكن رعايتهم... أدفنهم بالشفلات..هاي رعايتهم...يكولون أعرضهم بالتلفزيون... هذوله سلمو....يعني راح أخليهم طيبين يااخي... زين وين أحطهم.. هالبشر هالكثر...كمت أوزع بيهم عل المحافظات..ولهناك من هينه البكلينات ادزها والشفلات ) لەدوای ئەو ڕێنماییە دڕندانەیە ،فەرمانیکی بە ژ: ٢٣٩٦لە ١٩٨٧/٤/٦داوا دەکا هەمو ئەو خیزان وپیرو مندال و نیرو مێ لە ماوەیەك کۆتاییان پیبهینن بە شۆفل ، چەند سەرچاوەیەکی جیاجیا بەو شیوەی خوارەوە زەرەر وزیانەکانیان دیاری کردوە :

a. واباوە 182000شەهیدی بیسەروشوین ، ئەو ژمارەیە سەرچاوەکەی (ی ن ك) وخودی مام جلالەبەلام گەواهی کراوە( The 1988 Anfal campaign in Iraqi Kurdistan ) هەمان ژمارەی تۆمار کردوە .

b. گوندی ویرانکراو 4000-5000 .

c. قوتابخانە 2000 .

d. مزگەوتەکان 2500.

e. بیجگە لە و182000بزرەی زیاتر لە ملیۆن ونیویکیش ئاوارە کران لە جیی ورِیی خۆی ، بەشی هەرە زۆری کوردستان بوە (مناطق محظورة) ، هەمو کوردستان لە 80-90کم[2] کۆکرایەوەو کەوتە قۆناغیکی زۆر مەترسی .

بەشداری کورد: هەرچەندە دەسەلاتی کوردی ڕای وایە کەمتر ئەوباسە بکریت ،باسی بەشداری کورد ،تەنانەت رازی نەبوو ئەوانەی بەشداری ئەنفالیان کردوە وداواکرابوون لەدادگای بەغدا بدرینە دەست، ویستویەتی وانیشان بدا کە ئەو هەلمەتە لە نیوان دوو نەژادی جیای عرب بەرامبەر کورد کراوە ،تا ڕادەیەك ڕاستە مادام سەردەم باسی نەتەوەو میلەتانی جیایە دەکریَ وابلَیی ،بەلام ناکریَ عربیَکی چاکەکار و کوردیکی یارمەتیدەری ئەنفال وەك یەك هەژماربکەی ،چونکە ئاوا هەبوە ، لەسەر ئەو بنچینەیە پرسی ئەنفال تاوانی کوردی خۆشی تیدایە ،بەو ئەندازەو بەو چۆنایەتیەش دەبیَ بزانریَ کە تاوانبارکردنی کوردبە جینۆسایدی ئەرمەن چەندە هەلەیە ئەگەر بەهۆی چەند سەرۆك عەشیرەتیکی جاش بیَت.

بەشداری کورد لە فەوجی خفیفە(ئەو کاتی بوە افواج دفاع الوطنی) مەفرەزەکان دیَت ،بە پیَی نوسراوی(قيادة فيلق الاول ذ:٧٠٤ لة ١٩٨٧/٦/٨ ئةرك ومافی دیاری کردوون لە پرۆسەی ئەنفال وا هاتوە: ( تقوم مجاميع المتطوعين وافواج الدفاع الوطني بمهمة اقتحام القرى المنوي ترحيلها وازالتها )، هةروةها لة برِطةى 7ی نوسراوی (قيادة مكتب تنظيم الشمال) ژ: ٤٠٠٨ رۆژی ٢٠ / ٦ / ١٩٨٧ ( يعتبر كل ما يحصل عليه مستشارو افواج الدفاع الوطني او مقاتلوهم يؤول اليهم مجانا ، ماعدا الاسلحة الثقيلة و الساندة و المتوسطة اما الاسلحة الخفيفة فتبقى لديهم و يتم اعلامنا باعداد هذه الاسلحة فقط ) واتە ئەوان لەپیشەوە دەچنە ناو گوندەکان وتیَکی دەدەن وتالانەکەش بۆخۆیانە جگە لە چەکی قورِس، بەلام ئەو فەوجە کوردانەو موستەشارەکان بۆیان نەبوو پاریزگاری لەگوندەکانی خۆشیان بکەن ،لەو بارەیەوە دەقیکی علی حسن مجید هەیەو بە دەنگی خۆی ودەلیَ( وكلتلهم.. وكولولهم خاف تنحرجون من الأفواج ولمن يكولوك احنه قريتنا راح تبقى؟...كوللهم أخويه.. شنو

قريتك تبقى..ما أكدر أبقيك... لان أني راح اضرب بالكيمياوي ..فتموت انته وربعك...لازم تشيل...حتى اضرب بالكيمياوي ..شنو شيل؟؟.. من هسه أخويه شيل.. لا... أهجولهم..).

لەبارەی بەشداری فەوجەکانی کورد لە پرۆسەی ئەنفال زۆر فراوانە ،هەرتەنها ئەولیستەی خوارەوە نیە کە لەرۆژنامەی (الثورة)ی رۆژی 1988/4/18بلاوکرایەوە ژمارەیان 77 فەوجە ، مەرجیش نیە هەمو ئەوانە زۆرخراپ بووبن ، هەندیك لەوانە چاکەیان کردوە ،لەوانەش خراتر هەبوەو ناویان نەهاتوە، بە پێی هەندی سەرچاوەی تر سەرجەم فەوجەکان 350 بووینە ،دەقەکەی:

"أسهم فى عمليات الآنفال كل من المقاتلين التاليه اسماوهم وكل منهم على راس أحد أفواج الدفاع الوگنى الشجاعه مستشاراً أو أمرا

١- المقاتل لطيف أحمد الزيباري

٢- المقاتل صابر رقيب الشورجي

٣- المقاتل محمد كريم الزيباري

٤- المقاتل ابراهيم علي الحاج قلو

٥- المقاتل عاصف أحمد الزيباري

٦- المقاتل سعيد يونس الزراري

٧- المقاتل فتاح كريم الجاف

٨- المقاتل صادق زيرو الهيركي

٩- المقاتل طارق فائق الكاكي

١٠- المقاتل مدحة توفيق الداودي

١١- المقاتل مامند محمد مولود الكردي.

١٢- المقاتل جياي ديوالي الدوسكي.

١٣- المقاتل سعاد فيض الله الطالباني.

١٤- المقاتل طارق شفيق نعمان الكافروشي.

١٥- المقاتل معتصم عبد الكريم البرزنجي.

١٦- المقاتل رفعة محمد علي كلي.

١٧- المقاتل محمد علي حسن شميراني.

١٨- المقاتل كسرى محمد سعيد الجاف.

١٩- المقاتل رشيد حمه أمين.

٢٠- المقاتل الكور عبد الكريم الكزنداني.

٢١- المقاتل طاهر علي الجباري.

٢٢- المقاتل محمد عيسى الجاف.

٢٣- المقاتل ابراهيم نصر الله.

٢٤- المقاتل محمد طاهر زيناوه.

٢٥- المقاتل خليل ابراهيم

٢٦- أنور محمد رضا الجاف.

٢٧- المقاتل خضر فتاح حسين قاميش.

٢٨- المقاتل الشيخ نجم الدين الشيخ صالح البرزنجي.

٢٩- المقاتل تحسين شاويس سعيد.

٣٠- المقاتل محمد سعيد الهاروني.

٣١- المقاتل محمد رشيد الجاف.

٣٢- المقاتل شيخ طيب شيخ عثمان الجاف.

٣٣- المقاتل الشيخ رضا طه محي الدين.

٣٤- المقاتل عدنان عبدالله نجم الجاف.

٣٥- المقاتل محي الدين شيخ عزيز البرزنجي.

٣٦- المقاتل سعيد محمد غريب الجاف.

٣٧- المقاتل حسن محمود الهورقاني.

٣٨- المقاتل صديق علي محمد أمين.

٣٩- المقاتل نوزاد أنور خوشناو.

٤٠- المقاتل اسماعيل محمود رسول اغا بشدري.

٤١- المقاتل حمزة عباس مامند اكو.

٤٢- المقاتل محمود حمه رسول اغا بشدري.

٤٣- المقاتل مجيد بايز حسن البرزنجي.

٤٤-المقاتل كريم عبدالله محمد.

٤٥- المقاتل عباس حاجي اغا رسول تركوش.

٤٦- المقاتل محمود حمه أمين حمه كولي.

٤٧- المقاتل فواد كريم محمد هماوندي.

٤٨- المقاتل سعيد أسعد شيتنه.

٤٩- المقاتل قادر سوار اغا بلباسي.

٥٠- المقاتل محمد عمر أمين باسكاي البرزنجي.

٥١- المقاتل فارس طاهر مصطفى الغفوري.

٥٢- المقاتل عثمان عمر مام يحيى الكورني.

٥٣-المقاتل عباس بايز بله.

٥٤- المقاتل خالد محمود أحمد علي غوارة

٥٥- المقاتل جمال فقي حسين كلهوري.

٥٦- المقاتل رسول مامند فيرودلي.

٥٧- المقاتل عمر حمه رستم شرمكه.

٥٨- المقاتل صباح سعيد كريم هواري.

٥٩- المقاتل عمر بابكر سليم اغا بشدري.

٦٠- المقاتل محمود أحمد شريف غوارة.
٦١- المقاتل ابراهيم كانيي بالو.
٦٢- المقاتل محمد علي بسكول.
٦٣- المقاتل عبدالله حسن صالح بابان.
٦٤- المقاتل محمد أحمد بسكول.
٦٥- المقاتل خضر رشيد بجري
٦٦- المقاتل بايز عزيز رشيد.
٦٧- المقاتل علي أورحمان الكوراني.
٦٨- المقاتل سوارة فتاح فرج.
٦٩- المقاتل توفيق سليمان ياسين.
٧٠- المقاتل حميد نوري خورشيد الهاركي.
٧١- المقاتل علي الشيخ أمين فرج.
٧٢- المقاتل حسين الشورجي.
٧٣- المقاتل أسعد الهركي.
٧٤- المقاتل فخري أسماعيل عبد القادر.
٧٥- المقاتل شريف محمد معروف كرداوي.
٧٦- المقاتل قاسم كريم أحمد شنكي.
٧٧- المقاتل كمال محمد مام سوراني".

کاردانەوەی کورد: لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی عیراق ئیران گورزی گەورەی بەعس دژبە کوردو ئەنفال کردنیان ، وەك دەوترێ بۆ هەر کارێك کاردانەوەی دەبیت ،وا دەرنەچوو جاریکی تر شۆڕشی نویش لەشیوەی شۆرشی ئەیلول شکستی هینا ،بەدەگمەن هەندێ مەفرەزە لە هەندی شاخی سەخت مانەوە ، قۆناغیکی زۆر تەنگ ڕووی لە کورد کرد ، مەترسی گەورە هەبوو نەك بەرامبەر بزوتنەوەی کورد بەلکو بەرامبەر خودی کورد ،بەلام عیراق خۆی تووشی شەڕێکی تر کردلەگەل کویت ودوای شکاو ڕاپەرین هەلگیرسا وەك کاردانەوەیەکی ڕاستەقینەی ئەنفال ،بینیمان ئەو میللەتە بوو ڕاپەڕینی بەرپاکرد، زیاتر لە 150000 ئەفسەر و سەربازی عەرەب و بەعسی بەدیل گرت، کە پێش دوو ساڵ ئەوانە بوون کوردیان ئەنفال کردبوو، کەچی لە بەرامبەردا مەردانە بە نان و ئاو و جل و بەرگ پیێدان ئازادیان کردن، نەك تۆڵەیان لێ بسێننەوە، بە سەلامەتی گەڕانەوە ناو ماڵی خۆیان هەتا ئەو

خەڵكەی جەرگی سووتابوو دەستیان بۆ نەبردن لەو قات و قڕیەی نانی خۆیان دانیٚ و بەڕیان كرد ... سرنج بدە ئەو دوو ئاراستە پێچەوانەی.

لەسەر ئاستی نوسین وشێكردنەوەش بەشێك لەبیریارە نەتەوەییەكانی كورد بە هەڵە باس لەوە دەكەن دەڵێن ئەوە یەكەم جار نیە ئێمە ئەنفال دەكرێین و ئیتر لەبەر ئەو ناوە كە لە قورئان وەرگیراوە بەشێك كاردانەوەیەكی توندیان بۆ دروست بووە لە دژی ئیسلام ...، بەڵام بەسەرنجێك سادە دەبینین ئەو ناوانە بە ئەنقەست هەڵدەبژێرن ... مەبەستێكی هەمە ڕووە ... لەلایەك بۆ خودی دژی ئاینەكەشە چونكە (عەقیدەی بەعس)وەك خۆیان لە ڕاپۆرتە سیاسیەكان ودەستورو منهجی حزب تۆماریان كردووە عەقیدەیەكی عەلمانی سۆشیالستی نەتەوەییە و لە دروشمی (وەحدە- حریە- اشتراكیە) دەدرەوشێتەوە ،لەلایەكی تر بۆ ئەوەی میللەتی كورد بەرەو ئاین نەڕوا هەتا شەخسیەتی كورد وژێرخانی ڕەوشتی دابەزیٚ تا بەئاسانی داگیر بكریٚ بیٚ بەرگری ، ئەگینا هێرشەكانی وێران كەری بۆ سەر ئێران بۆ سەر كوێت هەر بەناوی ئاینەوە هەتا لە 1997/8/31كە هەولێری گرتەوە عملیەكە ناوی (عملیات توكل علی اللە) بوو ئیتر نە ئیسلامی بەشدار بووە نە لە شەرە برا كوژیەكەش..، حزبی بەعس ناوی سەربازگەو پرۆسە سەربازیەكانی ناوی ئاینی لێدەنا ،داهێن و دەستكەوتەكانیش ناوی عشتار وئاینی كۆنی عەرەبی لێدەنا كە فڕی بەسەر ئاینی ئیسلام نەبوو .

ئەوە هەمان سیاسەتە كەلەسەرەتای دروست بوونی دەولەتی عیراقی پەیڕەو كرا ،بەریتانیا سوپای عیراقی دروست كرد دژ بە شۆڕشی بیست كە شیعەكان سەركردایەتیان دەكرد ڕێك یەكەم گوردانی سوپای عیراقی بەناوی (ئیمام كازم) كرد ،قەول بوو دوەم گوردانیش بە ناوی خاتوو مسبیل بێت .

بەشداری عربی: كوردی بی حكومەت وبیٚ چەك بزانە جیهانی ئیسلامی چی پێكردوە ، لەسالی 1963لە هەلمەتی یەكەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەكان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا ، پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفرۆكەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاكستانیش یارمەتی عێراقیان دا[1042]، یەكەم سكاڵای جینۆساید سۆڤیەت پێش كەشی نەتەوە

[1042] ڕۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەیلول - ل168

یەكگرتوەكان كرد ـ ( وثيقة رقم E/3809 9تموز1963الجلسة 36، المادة رقم 1 في جدول الاعمال، سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية" طلب اضافة فقرة جديدة الى جدول الاعمال ـ رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة )[1043].

له ئەنفالی دووەمی 1988 لەسەرئاستی عەرەبی تەواوی جامیعەی عربی(جگە لەليبياوسوريا)پالپشتی عێراق بوون دژ بەكورد، پالپشتی وولاتانی كەنداو وخودی شای ئوردەن وسەرۆكی ریكخراوی فلستين وسەرۆكی يەمەن لە ریزی پیشەوە بوون ، ئەو جارە توانیان فتوا لە هەندی زانای سونی وەرگرن ،بەلام مەلای كورد ئامادە نەبوو ،عزت دوری توانی ئەو فتوايە لەهەندی شیخی تەریقەتی كورد وەربگری كە تا ئیستا روون نیە ئەوانە كێن. هەندی وولاتی عەرەبی هێزیان نارد بەشداری ئەنفالی كردوە (وەك لە دانپێهێنانی مدیری هەوالگری گشتی بەعس- وفیق سامرائی)یەمەن بە لیوای(عروبە)وئوردەن بەلیوای(یەرموك)و سودان بە(متطوعين)وولاتانی كەنداویش بە یارمەتی مادی بەشدار بووینە[1044]، وراهێنەری ڤەنزویلی وروسی وكۆبی وزۆر لای تر بەشداربووینە .

خاله وێكچوەكانی قڕكردنی میلەتان

زۆربەی هەلس وكەوتی ئەو دەسەلاتانەی تاوان باران بە قڕكردن وجینۆساید كردنی میلەتان خالی هاوبەشیان هەیە ،لەوانە:

1-لە هەموی چەند كەسانێك هەن زیاتر لەوانی تر تاوان بارترن ، یان عادەتەن سەرۆكەكەیان متمانەی بە یەكێكیانە بۆ سەرپەرشتی ئەو هەلمەتەو وەرگرتنی ڕێنمایی تایبەتی ، لە عیراق علی حسن مجيد

---

[1043] Fo.371-1703415 رقم:E3909ئیس بوریسوف سەرۆكی نوینەرانی سۆڤیەت لە دانیشتنی ژ:36 ی نەتەوە یەكگرتوەكان.

[1044] وفیق سامرائی- حطام بوابة الشرقية ص130 .

له توركيا نورالدين پاشا، تەلعەت پاشا،جمال پاشا كه ناوى به(جمال سفاح) رۆيشتبوو،له ئەلمانيا هيدريتچ ،ناوى به (جەلاد)رۆيشتبوو[1045] هەروەك على حسن مجيد به(على كيمياوى )رۆيشتبوو .

2-هەروەك هتلەر داواى خوينى ئەلمانى پاكى دەكرد،روزبرگ دەيووت(يەهودى خوينى ئەلمان پيس دەكا)، سەداميش هەمان داوا (اجتثوا من أرض العراق لكيلا يدنسوا الدم العراقي ..أجتثتهم الثورة من الجذور لكي تنهيهم وتبقي العراقي الصافي)[1046]، 3 سەركردەكەى ئيتحاديش وايان به ئەرمەن دەووت .

3- هەروەك عيراق بنەما ئاينيەكانى بەكاردەهينا (ئەنفال) ،هتلەريش دەيووت:مسيح گەورەترين شەڕكەربوە دژى يەهودى،منيش ڕينماييەى مسيحى جيبەجى دەكەم،سۆشياليستى نيشتمانى (نازى ) هاتوه بۆ پيادەكردنى مسيحيەت وقڕكردنى يەهودى[1047]، ئيتحادى عوسمانيش دەيووت له جياتى عەمرەو حەج ئەرمەن سەرببڕن.

7-هەردوو حزبى بەعس ونازى يەك جۆره عقيدەى سۆشياليستيان هەبوه ، نازى

ناوى پـارتى كرێكـارى سۆسياليسـتى نەتـەوەى ئەلْمانىيـە، National so zialis Tishe Deutsche Nazi Arbeieer partei [1048]، هەردووكيشـيان لەگـەل ئيتحـادو تـەرەقى تـوركى يـەك تيڕوانينـى ڕەگەزپەرستى و مەركەزى خوێن ڕێژيان هەبوو .

8-هەر ئەلمانيەك هاوسەرى لەگەل يهودى بكردايه له فەرمانبەرى حكومەت دەردەكرا، له عيراقـيش بـە پێى بڕيارى(ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆرش ژ:474-مانگى 1981/4 ژنەكى تەبەعى (كـوردى

---

1045 هيدريتچ له 1942 به فەرمى بوه سەرۆكى جستاپۆ(دەزگاى هەوالگرى) له ئەلمانيا لەسالانى 1932 بەدواوه ناويشى به جەلاد ناوزەد دەكرا، دواى تيرۆركرا ئەلمانيا له تۆلەى تيرۆرەكەى ئەو گوندانەى تيكپووخاند •بڕوانه: القاموس السياسي –احمدعطية الله ط3ص1368

1046 صدام حسين–جريدة الثورة ١٩٨١/٢/١٦.

1047 Friedioner – nazygermany and the gews p102

1048 الموسوعة العالمية ج17 ص194 هەروەها ( القاموس السياسى ) .

فەیلی)تەلاق بدابایە 4000دیناری پاداش دەدرایە ، لـە جینۆسـایدی ئەرمـەنیش نـەك هاوسـەری بەلكو بە كەنیزەش قەبوول نەدەكرا.

9-بانگێشەی سۆپەرمان بە ئەلمانی –لۆیەرمانیش بۆ خەلكی تر، لە پـۆلێنی نەتـەوەكانی تـر میللـەتی یەهوود بە نزمترین ژمێـردرا،زاراوەی (sub-man) واتـە(مادون الإنسـان) بۆدیـاری كرا،كتێبێكـی فایخنجەر بەناوی( الشخصیە والجنس)باس لەوە دەكا كە چۆن بۆ دروست كردنی مندال تێكەلی توخمی ئافرەت لەگەل توخمی پیاو دەبێتە هۆی لاوازی كە سـێتیەكەی ئـاواش تێكـەلی توخمی(نـا ئـاری بـە تایبەتی یەهودی) دەبێتە لاوازی كەسێتی كۆمەڵگە، بەهەمان شیوە لە عیراقیش تیكەل بوونی غەیرە عرب كۆمەلیك سزاو پاداشی هەبوو .

10- ئەلمان فەزلی بەسەر میلەتانی تر هەیە ،لە عیراقیش عرب فەزلی بەسەر میلەتانی تر هەیە.

11- لە ئەلمانیا (اللاسامیە) لە عیراقیش(اللاشعوبیە).

12- دیكتاتۆری وتاك حزبی نازی ،هەمان شیوازی عیراقو توركی ..

13- میژوویەكی پڕجەنگی نـازی و هـەمان میـژووی پڕجـەنگی بەعسـی و پڕجـەنگی ئیتحـادی عوسمانی ..

14-لە ڕووی ئایدیۆلۆجیای ناشیۆنالیزمی ..لەمادەی (4)ی‌بەرنامەی حزبی نازیە كەواهاتوە(یس من المواطن الامن كان من ملتنا-valksgenoss-ولیس من ملتنا الا من كان دمة المانیة ،اذ لیس لأی یهودی ان یكون من ملتنا)[1049]،..ئەوە لە دەستوری (حزبی بەعسیش)وزۆربەی تەیاری عروبی وتۆرانی ڕەنگی دابۆوە،لەدەستورو منهجیاندا لەمادە(15)ی دەستوری حزبی بەعس واهاتوە:(الرابطة القومیة هي الرابطة الوحیدة القائمة في الدولة العربیة التي تكفل الانسجام بین المواطنین وانصهارهم في بوتقة واحدة، وتكافح سائر العصبیات المذهبیة والطائفیة والقبلیة والعرقیة والاقلیمیة) ،لەقوەوە دروشمی (أمة عربیة واحدة ذات رسالة خالدة) و (خیر الآمة) هاتۆتە كایەوە .

15- بەهـــەمان شـــێوە دروشمـــەكانی ( پـــان عـــەرەبی) ... مادەكـــانی(1-5)هـــەروەها(64-

[1049] بروانە: الارهاب السیاسی ص134

68)دەستوری توركیا...

16-بنەماكانی نازی (پاكی ئاریو ناپاكی خەلكی تر،دەسەلاتی موتلەقی سەرۆك،سەروەری دەولەت ،خۆپرچەككردن)،هەمان بنەمای حزبی بەعس.

17- لە برگەی (3) مادەی(1)ی دهستوری حزبی بەعس دەلێت:( الوطن العربي للعرب، ولهم وحدهم حق التصرف بشؤونه وثرواته وتوجيه مقدراته) ئەوە هەمان دروشمی نازیە (ئەلمان بۆ ئەلمانیەكان ولەسەرووی هەموانە)... لەگەل زۆر لای تر

ئەگەر بەوورد تر سەرنجیان بدەیێ زۆر لای تری ویكچوویان هەیە .

<u>تاوانباركردن ودادگایی:</u> پالپشت بە دانیشتنی رۆژی2008/4/14و دوای سەرۆكایەتی كۆمار پالپشت بەوەو بەمادەی 61ی دەستور بریاری ژ:26ی سالی 2008ی دەركردكەتیایدا هاتوە :ئەوەی بەسەر كوردهات لە ئەنفال جینۆسایدە بەهەمو پێوەرەكان ..

ئەوانەی دادگایی كران(علی حسن مجید-صابر عبدالعزیز دوری-حسین رشیدتكریتی-فرحان موتلەگ عانی-سولتان هاشم...)

اتفاقية منع جريمة الإبادة الجماعية والمعاقبة عليها

09-12-1948معاهدات

أقرت وعرضت للتوقيع وللتصديق أو للانضمام بقرار الجمعية العامة 260 ألف (د-3) المؤرخ في 9 كانون الأول /ديسمبر 1948

تاريخ بدء النفاذ: 12 كانون الثاني / يناير 1951، طبقاً للمادة الثالثة عشرة

إن الأطراف المتعاقدة:

إذ ترى أن الجمعية العامة للأمم المتحدة، بقرارها 96 (د — 1) المؤرخ في 11 كانون الأول / ديسمبر 1946، قد أعلنت أن الإبادة الجماعية جريمة بمقتضى القانون الدولي، تتعارض مع روح الأمم المتحدة وأهدافها ويدينها العالم المتمدن

(33)

## شۆرسی ئۆكتۆبەر ثورة اكتوبر October Revolution

**ئەوانەش دەگریتەوە( شیوعیەت ،ترۆتسکیەت ،بلشفی،مەنشەفی ،شۆرشی چەواشە ،سۆڤیەتیات . کادیت، ئەکیتابرین،بیرۆسترۆیکا،گلاسنۆست..)**

بە کۆمەلیك ڕووداو گۆڕانکاری ڕاپەرینی روسیا دەووترێ شۆرشی ئۆکتۆبەر کە ترۆکەکەی سالی 1917 گەیشتە ئاستی ڕووخانی دەسەلاتی قەیسەرو دەسەلات گرتنی شیوعیەکان (کە لەو کاتی پێیان دەووترا بەلشەفی- bolshevism –لە ووشەی ( bolche )ی روسی هاتوە بەمانای زۆرایەتی توند، لە بەرامبەر مەنشەفی (واتە کەمایەتی)،بوونی ئەو زۆرایەتی وکەمایەتیە لە چوارچێوەی کۆمیتەی سۆڤیەتیات دێت، شۆڤیەتیات بەمانای شورا دێت، بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917دوایش ئەو (سۆڤیەتە)دروست بوو کاتێ کرێکاران و جوتیاران و سەربازانیش ئەو ئەنجومەنەیان پێك دەهێنا بۆ هەڵبژاردنی نوێنەریان و دوای بووە سیستەمی بنچینەیی دەوڵەت[1050].

شۆڕشی ئۆکتۆبەر زۆرترین گۆڕانکاری گەورەی بەدوا داهات ، یەك لەشۆڕشە گرنگەکانی جیهانی هەژماردەکریت ، بەشی هەرە زۆری رۆژی 23 /2/ 1917بەرۆژی شۆڕ ش وسەرکەوتن هەژماردەکەن کە رۆژی جیهانی ئافرەتانیشە ، سێ قۆناغی سەرەکی بینیوە ، قۆناغی بێسەروبەری و سەرکەوتنی شۆڕش بە سەرۆکایەتی برجوازی ودژە شۆڕشان ،قۆناغی دوەم دەسەلات وەرگرتنی بلشفیەکان ،قۆناغی سییەم شەڕی براکوژی و پیکهاتنی یەکیتی سۆڤیەت .

<u>بارو دۆخ و هۆکاری شۆڕش</u>: روسیا لەسەر دەستی پترۆسی گەورە دروست بوەلەسالی 1721 ، بەلام دەتوانین بلیین لەسالی 1613هوە لەلایەن بنەمالەی رۆمانۆفەوە حوکمیکی سیۆکراتیانەی روسیا دەکریت ،لە سەرچاوە ئیسلامی وئەکادیمیەکانی جاران بە شوینیکی ئەستۆری ولێل و تاریکایی ناوزەد دەکرا لەبەر نزیکی لە سیبریا ، لەکۆتاییەکانی تەمەنی عوسمانی پێکدادانیکی زۆر لە نیوانیان

---

[1050] لەبنەچەدا ( سۆڤیەت ) وشەیەکی ڕووسیە بەمانای ( ئەنجومەن ) یان ( شورا )، یەکەم جار لە ڕاپەڕینە کرێکارییەکانی 1905 درووست بوو کە ( لینین) ناوی بردن بە پڕۆڤەی شیوعیەت.

ڕوویدا،زیاتر روسەکان سەرکەوتن ،لەکاتیکا بوو عوسمانی لە ئەوروپا سەرکەوتوو ببوو ،بەو هۆیەوە لە کۆتایی سەدەی بیستەم بوە وولاتیکی حیساب بۆکراو لەسەر ئاستی نیو دەولەتی ،خاکەکەی 6ملیون میل دوجا ،بەو شیوەیە بوە بەشیك لەجەنگی جیهانی یەکەم ،
پۆستەکان زیاتر بەدەست دوو حزبی برجوازی بوو (کادیت-پارتی دەستوری دیموکراسی ، ئەکیتابرین پارتی برجوازیە مەزنەکان).

هەرچی هۆیەکانیەتی بریتین لە: (زیانی زۆری روسیا لەجەنگی جیهانی یەکەم1914تا1918 – قەیرانە ئابوریە کوشندەکانی –،برسیەتی وبیکاری –گرانی وبەرزبوونەوەی نرخ- بلاوبوونەوەی گەندەلی و بالبالێنی ، هەندی سەرچاوە زیانەکانی روسیالە کوژراو وبریندار وبزر بە 5 ملیۆن دەقەبلینن ، راپەرینی 1905 یش هەر لەشەڕی یابان هات ، وادیارە هۆکاری بنچینەیەکەی ئەو جەنگە بوە هەروەك ترۆتسکیش وای لیکدایتەوە ، لە گوندو شار نەبوونی ونهاتی بوو ،گۆشت وئاردو نانەواخانەکان لەشارەکان کەم بوو بەتایبەتی لە پترۆسپۆرگ ، چەندین کارخانە داخران ، وولات بوە دوو چین برسی و بەشیکیش لە ئەرستۆکرات ودەولەمەندەکان لەوپەڕی خۆشی بوون . یان وەك موسوعەی بریتانی((Encyclopædia Britannica)) دەلیت پیش شۆڕش پەیوەندە قەیسەرو میلەت بەتەواوی پچڕا بوو .

<u>شۆڕش:</u> بە هۆی دەسەلاتی شیوە ئیمپراتۆری چەندجاریك ڕاپەڕین کراوە لە میژووی روسیا لە1830،، 1863م بزوتنەوەیەکی جەماوەری لە دژی (قەیسەرنکۆلای دوەم) لە 1905 ەوە سەری هەلدابوو، بوە هۆی هەندێ چاکسازی کەبە زمانی روسی پێی دەووترێ ( Russian Oktyabrsky Manifest)،لەبەر توندی زۆری شەڕانی ناوی نیکۆلا بە (نیکۆلای خویناوی)دەبرا،جگە لەجەنگی جیهانی لەگەل عوسمانی ولەگەل یابانیش لەشەڕدابوو ، نەك تەنها کرێکاران (هەروەك سەرچاوەکانی مارکسی وایان بلاودەکردەوە)بەلکو زۆربەی جەماوەرو چینی برجوازیش ناڕازی بوون، مانگرتنی کرێکاران هەبوو شان بەشانی فەرمانبەرانیش، چەند قۆناغیکی سەخت وهەورازو نشیوی بەخۆوە بینی، چەندجاریك حکومەتیان گۆڕی وحکومەتی کاتیان پێکدەهینا بۆ خەفە کردنی ڕاپەڕین

وشۆڕش، یەکەم گلپەی بە ڕاپەڕینێکی ئافرەتان لە 1917/2/23 سەرەتایی ئەوشۆڕشە دەستی پێکردبە خۆپشاندان و نارەزایی لە(بترۆگراد)،ئینجا قەیسەر نیکۆلاوەك لە یاداشتەکانی(رۆژی هەینی 7ی تەموزی) خۆی باسی کردوە دۆمای پەك خست ودەلیٚ:(صبيحة مليئة بالمشاغل. تأخرت نصف ساعة عن حضور غذاء الضباط... وهبَّت عاصفة ثقيلة، وكان الجو خانقًا. تنزهنا معًا. استقبلت غوريميكين، ووقعت المرسوم الخاص بتعطيل اجتماعات مجلس الدوما. تعشيت عند أولغا وبيتيا، وقرأت طوال السهرة. إن إشارة التعجب المكتوبة بعد نبأ تعطيل اجتماعات مجلس الدوما، تمثل أقصى انفعالات القيصر)[1051]، دوای (دوما- بەرلەمانی)هەڵوەشاندەوە,دیسان حکومەتیکی کاتیان دروست کرد، (رودجیانکو)ی سەرۆکی پەرلەمان بەبێرەزامەندی قەیسەر کۆبونەوەیان لە 1917/3/12کردو قەیسەر رازی نەبوو بەلکو فەرمانی دەرکرد لە خۆپیشاندەرانی پترۆسبیرك بدریت سوپا رەتی کردەوەو چوونە پال میلەت، لە 1917/3/15 قەیسەر نیکۆلا دوورخرایەوە لەدەسەلات ، دوای تەشەنەی کرد زۆربەی چینەکانی تری قوتابیان و لاوان و فەرمانبەری گرتەوە، لە دوایشدا لە ناو سوپاش یاخی بوون, لە 28ی هەمان مانگ قەیسەر بارەگای سەرەکی خۆی بەجێهێشت ودەسەلاتی درا بەبرایەکەی میخایل رۆمانۆف،... بەو شێوەیە سەرەتا ئیمپراتۆریەت کەوت، خەڵکی دەستیان بەسەر دامودەزگا و بەندینخانەو حەمباڵەکاندا گرت, لەو کاتەی (لینین)دورخرابۆوە لە سویسرا لە 3 /1917/4ز گەڕایەوە بەسەر ئەو بیٚ سەروبەریەی ئەنجامی ڕاپەرین و توانی بیقۆزێتەوە بە قازانجی خۆی ئایدۆلۆژیاکەی ، جاڕی دا ئیتر دەبیٚ ئەو شۆرشە برجوازیە دیموکراسیەش بگۆڕدریٚ بە شۆرشی سۆشیالیستی و چینی کرێکار (برۆلیتاریا)بێتە سەر حوکم ،کەلەوکاتی حزبی بەلشەفی بە سەرۆکایەتی لینین نوێنەرایەتی دەکردن وترۆتسکیش کەسی دوەم وچالاکوانی شۆرش بوو بەپیٚ ی مەبادیئەکانی شیوعیەت,لە بەرامبەریشدا بالێکی تری مارکسی (مەنشەفی)کەمایەتی بوون پێیان وابوو کاتی شۆرش نەهاتوە، لەبیٚ سەرووبەری هەڵچوونی جەماوەری وادا هەریەکە بەلشەفی و مەنشەفی و سۆشیالٚ دیموکراسی و برجوازی شەرە خۆپشاندانیان دەکرد،زاراوەی (شۆرشی)چەواشە ئەو کاتی سەری هەلدا لەبەشدارکردنی هەندیٚ چەپ و مارکسی

---

[1051] تاريخ ثورة الروسية ج1 ص81.

مەنشەفی وسۆشیال دیموکراس لە حکومەتی کاتی قەیسەر، ئەوانە بەشداریان کرد لەگەل حکومەت بۆسەرخۆپیشاندەرای (سان پترۆسپیرگ)کە بە 500000خۆپیشاندەر دەقەبلیندران ،دژ بە لایەنی بلشەفی ، دوای راستەوخۆ لیّك گیر بوون، حوکمەتی نویٚ لە سەرەتایی مانگی ئۆکتۆبەر ویستی لینین دەستگیربکات و رۆژنامەی (پرافداش)ی داخست, لە کۆنگرەی (6)ی حزب بە ئامادەبوونی ستالین و ترۆتسکی بریاریان دا بە چەکداری حوکمەتی نویٚ بگرن، ئەو بنەماو ئامانجانەیان بەرزکردەوە :

رەخساندنی خوار دن بۆ گشتی

ب-دابةشي زةوی بةسةر جوتیاران

جـ-هةلوةشاندنةوةی ضینایةتی

د -کؤتايي جةنط ونائارامی .

هــ-بەرپا کردنی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا

بەلام هیشتا لە قۆناغی شۆرش بوون ، چەند قۆناغیکی سەختی بری، دوای رووخانی قەیسەر حکومەت بەسەرۆکایەتی کرینیسکی (نیمچە لیبرالی) بو ە سەرۆکی حکومەت،ولە دوای شەروپیّکدادان و شۆرشی بەلشەفیەکان بە سەرۆکایەتی (لینین)سەرکەوتوو بوون بەیەکجاری ، قەیسەر( نیقولا دوەم) وهاوسەری کوروکچیکی خزمەتکاریەکان وپزیشکی تایبەتی پیکەوە کوژران لەسەر دەستی بەلشەفیەکان لەشەوی 17 /7/ 1918قۆناغی ئیمپراتۆریەتی روسیاو حوکمی بنەمالەی رۆمانۆف کۆتایی هات ،قۆناغیکی نویّی دەولەتداری وسیستەمی دەسەلات هاتە کایەوە .

ئەنجام و کاریگەکانی

دوای سەرکەوتنی لینین وبەلشەفی دەستی کرد بە خۆ توند کردن ودەست گرتن بەسەر دام ودەزگاو تەواوی جومگەکانی ژیان لە روسیا ، دوای جاریکی تر هەندی شەری ناوخۆیی دروست بوو،ململانیّیەکی توند لەنیّوان حزب ولایەنەکان هەبوو ، هەلبژاردن کرا بلشفی 175 کورسی هیّناو سۆشیالدیموکراس 410ی هینا،حکومەتیکی ئیئتلافی دروستکرا لەهەردوولا، دوای لینین دۆمای

هەلوەشاندەوەو بنەمای (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا)و سۆڤیەتاتی پەیڕەو کرد بە تاك حزبانە ، بۆیە هەندیك نالین شۆرشی ئۆکتۆبەر دەلێن پیلانی ئۆکتۆبەر (لەوانە : موسوعە المیسرە).دەتوانین هەنگاووکاریگەریەکان لە چوارچێوەی ڕووداوەکان بەو شێوەیەی خوارەوە :

1- لەجەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918)وهاوپەیمانی کشانەوە, قەرەبۆشی داو لەهەندی خاك تنازلی کردبۆ ئەلمانی ، ئینجا کشانەوە لە (سایکس پیکۆ)کە سازانۆفی وەزیری دەرەوەی روسیاش مۆری کردبوو ،لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش کشانەوەوهەستان بە ئاشکراکردنی ئەو ریکەوتنەش .

2-هەستان بەدروست کردنی یەکێتی سۆڤیەت ،دروست سەرکەوتنی شۆرش لە 1917 بوو بەلام یەکێتی سۆڤیەت لە 1922/12/30 دروست بووە، (سۆفیەتی جاران 22 ملیون کم$^2$) ولە 16٪ ی جیهانە، پێکهاتبوو لە 120نەتەوە و 15 کۆمار :(ڕوسیا، ئۆکرانیە، کازاخستان، ئۆزباکستان، ڕوسیایسپی، جۆرجیا، لتوانیە، ئازەربێجان، مالدڤیە، تاجکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستونیە، قیرغیزستان ) لە گەڵ هەندێ هەرێمی خود موختاریش بەناوی ( یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالیستی - إتحاد جمهوریات الإشتراکیە السوفیتیە)، ناوی نەتەوەیی بە ڕوسی ( سویز سۆڤیتك سوسیالیستی سیکخ ریبدبیك).

3-لە سالی 1921 بەیەکجاری شۆرشی سۆشیالیستی سەرکەوت ولە 1922 یەکیتی سۆڤیەت پیکهات ، یەکەم وولاتی سۆشیالستی لەسەر ڕارەوی مارکسی دروست کرد ،بەو پێ یە لینین بووە یەکەم موتەبقی مارکسیەت و ئەو سەربازگە گەورەیەی سۆشیالیستی لە پاش دروست بوو, جیهانی هەژاندو شۆرش لەدوای شۆرش هەتا سالانی حەفتاکانی سەدەی بیست بەردەوام بوو.

4- لە بارەی کەمایەتیەکان،پیشوو تر کەمایەتی ئاینی تر بارودۆخیان خراپ بوو لەدوای سەرکەوتنی شۆرش پەیامیك بۆ یەهودی وموسولمان نیردرا بۆیەهودیەکان : ئیوە ئازادن ئەگەر مافی چارەنوستان دەوێ وشوینیکیشیان لە ئازەربیجان بۆ دیاری کردن ،بۆ موسولمانانیش: ئەنجومەنی کۆمیسیۆری

بەلشەفی لە سالی 1917 لەسەروبەری ڕووخانی قەیسەر ئاگادار کرانەوە کە چەوسانەوەیان کۆتایی دێت ودەتوانن ئاینی خۆیان بە ئاشکرا بکەن ،ئیوە ئازادن بەهەمو جۆریك .

5- سەرەڕای ئەوانەش تەقەلای بە روسی کردن هەبوو کە پێی دەووترا (ترویسیە)بەو هەولانەی ستالین دەووترابۆ بە روسی کردنی زمان ونەریت وفەرهەنگی کۆمارەکانی تری سۆڤیتی[1052]، - بەروسی کردن واپێدەچی کۆن تربێت وەك فەرهەنگی سیاسی (ئارش) دەلی بەروسی کردن لەسەردەمی ئیمپراتۆریەکان ودواش لە سەردەمی شیوعیەتیش هەبوە بۆ تواندنەوەی میلەتانی تر لە روسی[1053] .

6- لە 1972/1/1 ژمارەی ئەندامانی حزبی شیوعی گەیشتە ترۆك (14)ملیۆن ونیو[1054] .

7- سەرۆکەکانی سوفیتی بریتی بوون لە : ( لینین :1917 – 1924 )، ( ستالین : 1924 - 1953 )، ( خرۆتچۆڤ : 1953 – 1964 )، ( برێجنێف : 1964 – 1982 )، ( ئەندرۆبۆڤ : 1982 – 1984 )، ( تشارنیکۆ : 1984 – 1985 )، ( گۆرباتچۆڤ : 1985- 1991 ) دوا سەرۆك بوو .

تەنینەوەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر(تصدیر الثورة)

ئەو شۆڕشە (مونتەلەق ومەدایەکی)تایبەتی خۆی هەیە بە هۆی جۆری ئایدیۆلۆجیای شۆڕش ،شۆرشی ئۆکتۆبەری1917ی روسیا بە سەرۆکایەتی لینین هەندێ شوێنی دەگرتەوە هەندێ شوێنی نەگرتەوە, بۆیە لە کۆتایدا کۆمەلێك دەولەتی لی دروست بوو بەناوی (سەربازگەی سوشیالیستی), هەرچەند مارکس و ئەنجلس و لینین پێشبینی هاتنەدی شۆرشی پرۆلیتاری مارکسی لە وولاتانی سەرمایداری بالا بکرێت, بەلام لە روسیا سەری هەلداو هاوشێوەکانی روسیاش گرتەوە، (پۆلەندا, رۆمانیا, بولگاریا,....), دوای تەواوی وولاتانی سوشیالیستی جیهانی گرتەوە.

---

[1052] الموسوعة الميسرة ص100.

[1053] فەرهەنگی سیاسی (ئارش)ل84 .

[1054] قاموس السياسي –یۆری ماریۆف ص109

دەتوانین بڵێین بریتی بوو لە بلاوبوونەوەی شیوعیەت ،بەلام بە دوو ئاڕستەی هاوتەریب ،ئاڕستەیەکی ئایدیۆلۆجی بەهێز شان بەشانی هێزێکی گەورەی وەك سۆڤیەت و وولاتانی سۆشیالیستی ،بۆیە دەبێ کەمێك بگەڕێینەوە سەر ڕیشەی مارکسی لە رووسیا.

بە پێی وەسفی ئەنجلس بۆ تەنینەوەی ئایدیۆلۆجیای شیوعیەت ئەوا لەسالی 1883 یەکەم تەیاری مارکسی لەسەر دەستی بلیخانۆف دروست بووە لە روسیا نەك لینین [1055] ، دوازدەسال دوای ئەو(وەك لینین خۆی دەلێت) لە سالی 1895 لینین کۆمەلی خەباتی لە پیناو رزگاری پرۆلیتاریا دروست کردوە[1056] ، لە 1898 یەکیان گرت وحزبی مارکسی(پارتی کریکارانی سۆشیال دیموکراتی)یان پیکهینا بەسەرۆکایەتی لینین وبلیخانوف، دووڕای جیا بوون دوای بلشفی ومنشفی لێدروست بوو[1057]، سەرەتا بلشەفیەکان وایان نواڕیە ئەو شۆڕش وراپەرینە کە بزوتنەوەیەکی برجوازیەو چاوەری بکەن تا قۆناغی خۆی دیت ،بەلام لینین لەگەل گەرانەوەی داوای کۆنفرانسی کردو تا هەلویستیان دیاری بکەن لەمەڕ ئەو شۆڕشە،تیایدا بڕیاڕ درا کە پیشڕەوایەتی ئەو شۆڕشە وەرگرن ، بلیخانۆف دوورخرایەوە ودوای گەڕایەوە ، **لە** دوای سەرکەوتنی لینین لە دامەزراندنی یەکیتی سۆڤیەت لەسەر ئەو ریبازەی خۆی ئیتر مارکسیەت وەرچەرخا بۆ (مارکسی –لینینی) ، بزوتنەوەی شیوعیەت گەشەی کردو پەڕیەوە بۆ زۆر شوینی جیهان ،زاراوەی (تصدير الثورة) سەری هەلدا ، بەمانای بەرپاکردنی جموجۆلّی سیاسی تا پلەی شۆرشی بەهۆی فاکتەرێکی دەرەوە، گەیشتە ئاسیاوئەفریقاو ئەمریکای لاتینی وئەوروپاش، یەکێتی سۆڤیەت بەهۆی ئایدۆلۆژی شیوعیەتە توانی بینایەکی مەزن لەناوەخۆ درووست بکا بگاتە ئاستێکی وا ڕۆژئاوای خستبوە تەنگەبەری، بەتایبەت دوای جەنگی جیهانی دووەم ڕۆڵی زیاتر دەستی پێکرد، وەك ڕزگارکەری جیهان لەدەست نازی ناوی دەرکرد، لەگەڵ ڕۆژئاوا هەردەم لە جەنگی ناڕاستەوخۆ و جەنگی ڕاگەیاندنی فکریو سیاسی و فەلسەفی و شارستانی بووە کە بە ( جەنگی سارد ) ناوبراوە، تا ڕادەی هاوتای لەگەل هیزەکانی رۆژئاوایی (ئەمریکاو بریتانیا وفرنسا) ، هەتا دوای حەفتاکانیش هەر لەزیاد بوون دا بووە، دوای

---

[1055] فريدريك انجلس- المبادئ الشيوعية ص15-17

[1056] فلادمير.إليتش لينين – عن النضال من أجل التحرر الوطني ، ت: سعد رحمي ص 8.

[1057] جون ريد- عشرة أيام هزت العالم ، ترجمة الناشر . دار التقدم ، موسكو ،1987م. ص19.

ئەوە هەندێ قەیرانی زانستی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی وای بۆ پەیدا بوو کە کاری زیاتر لەژێرخانی ئەو یەکێتی یە کردبەرەو گەڕانەوەو دوایش ڕووخان.

ڕووخانی: بەکورتی هۆیەکانی ڕووخانی سۆڤیەت بریتین لە (ڕوبوڕووبونەوەی زانستی نوێو ئایدیۆلۆجیای مارکسی-دواکەوتن وقەیرانی ئابووری - ڕووداوە سیاسیەکانی وەك سەرهەلدانی سەندیکا کرێکارەکانی ولاتانی سۆسیالیستیئەوروپای ڕۆژهەلات - شۆرشی ئیسلامی لە ئێران- شۆڕشی ئیسلامی لە ئەفغانستان - ڕووخانی دیواری بەرلین) .. هەمو ئەوانە لەگەل فاکتەرێکی ڕاستەوخۆش لەگەلیان سازا ئەوەبوو لەماوەی سێ ساڵ لە 1982هەتا 1985 سێ سەرەك مردن ( (بریجنێف، ئەندرۆبۆڤ، تشارنیکۆ) ، ئیتر ڕێ خۆش بوو کە (گۆرباتچۆڤ) بگاتە ترۆکی دەسەلات بەخۆیو ئەو بیرو بۆچوونەی (بیرۆسترۆیکاو گلازنۆست - واتە الانفتاح والشفافیة والاصلاح وأعادة البناء)تیهبرتر، ئەوە پاساوی ئەو چاکسازیانەی گۆرباتچۆڤ بوو کەلە ژێرخانی یەکێتی سۆڤیەتیو پەیوەندیەیەکانی ئەنجام دەدا، ڕەوتی ئەو چاکسازییە بەرەبەرە کۆنترۆل و ناوەندیەیەتی دەسەلاتی لەدەست دەدا و میللەتان و کۆمارەکانی سۆڤیەتیش بەرەبەرە سەریان راست کردەوە، تا گەیشتە ئینقیلابەکەی حزبی شیوعی لە 1991/8/19 دژی کۆرباتچۆڤ کردیان و سەرکەوتوو بوون، لێرەدا دەوری ( پۆریس یالتسین ) بۆ ڕۆژی دووەم دەرکەوت کە ئەو کاتی سەرۆکی کۆماری ڕوسیا بوو (لە چوارچێوەی یەکێتی سۆڤیەت )، لە دژی ئینقیلاب ڕاپەڕیو خۆپیشاندان و مانگرتن لەناو( مۆسکۆ ) دەوروبەریو ناڕەزایی کۆمارەکانی تر دوای (3) ڕۆژ ئینقلابچی یە شیوعی یەکان پاشەکشەیان کرد، گۆرباتچۆڤیان هێناوە دەسەلات بەبێ دەسەلاتی، زیاتر کۆنترۆل و ناوەندیاتی لەدەست چوو، کۆمارەکانیش داوای سەربەخۆییان بە ئاشکراتر کرد و حزبە شیوعی یەکانی کۆمارەکانیان دوورخستەوە، دوا دەستی پۆلاین لە یەکێتی سۆڤیەت و شۆڕشی ئۆکتۆبەر وەشێنرا ئەو کۆبوونەوەی

---

[1058] لە مێژوودا زۆر جار ئەو ریکەوتـەو هـاتنی دەرفـەتیکی دەگمـەن ڕۆلی گرنگـی بینیـوە ،دەگـۆترێ ئەگـەر نەخۆشـیەکەی (میزگیرانی)مەڕوانی دوا خەلیفەی ئەمەوی لە مەیدانی جەنگ لەگەل عەباسیەکان نەبوایە ڕەنگە عەباسیەکان سـەرنەکەوتبوونایە ،ئەوەبوو ئەو نەخۆشیە دەماودەستە وای لەمەڕوان کرد کەمیك دوورکەویتەوە بۆ میزکـردن وتووشـی سـەربازیکی عەباسـی بـوو وکوشتی ورەوتی جەنگ ومێژوو گۆڕدرا .

نێوان ( بۆریس یا لتسین –سەرۆکی ڕوسیا، لیۆنید کراتشۆك-سەرۆکی ئۆکرانی، شوسکنیچ –ڕوسیای سپی ) لە 1991/12/8بەستراو کۆتاییان بە یەکێتی سۆڤیەتی هێناو هەڵیان وەشاندەوە بە رەسمی لە 1991/12/31 لە تەمەنی (69) ساڵ و یەك ڕۆژ بریتیە لەتەمەنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کاریگەریەکانی .

(34)

# شۆرشی ئیسلامی ئێران    الثورة الاسلامية الإيرانية    Iranian revolution

**ئەوانەش دەگریتەوە (خمینی– پەهلەوی –محمدعلی جناح–کۆماری ئیسلامی– تصدیر الثورة)**

بەوزنجیرە خۆپیشاندان و سەرکەوتنانە دەووتریت شۆرشی ئیسلامی ئیران کە لە 2ی کانونی دوەمی 1978 سەری هەلدا،18 مانگی خایاند بە ڕابەرایەتی (ئایەتولا خومەینی)لەدایك بووی سالی 1902،لە سەرەتا شێوەیەکی گشتی دژایەتی شای ئیران بوو ،زۆربەی چین وتوێژەکان بەشداربوون ،دوای کەسایەتی خومەینی دەرکەوت وەك رابەری شۆرش و بە ناوەرۆکیکی ئاینی ، لە سالی 1979 سەرکەوت ،رژیمی شاهنشاهی تەمەن هەزاران سالانی گۆڕی بە سیستەمیکی کۆماری ئیسلامی ،کە تائیستاش دەسەلاتیان بەردەوامە ، هەندێ جار ئەو شۆڕشە بە شۆڕشی ئافرەتانیش ناوزەد دەکرێت لەبەر ئەوەی لەهەمو شۆڕش وڕاپەڕینەکانی تر زیاتر ئافرەت بەشدار بووینە بەچۆنایەتی وچەندایەتیەوە .

کۆمەلێك کەسایەتی ڕۆلی گرنگیان بینی لەو شۆڕشە لەوانە: (ایەالله خمینی –ایەالله شریعە مداری- ایە الله تالقانی –ایەالله مونتەزیری – خامنائی –رافسنجانی - ) لە ئەفەندیەکانیش (عبدالکریم سنجابی –مهدی بازرگان) لەکوردستانیش هەریەکە لە (شیخ عزالدین حسینی –ئەحمەدی موفتی زادە- دعبدالۆرحمن قاسملۆ) .

## سەربردەی شۆڕشەکە

بارودۆخی ئیقلیمی و دەولی زۆر نەسازابوو بۆ شۆڕشیکی (هەم ئیرانی هەم ئیسلامی)، ئەوسات و کات وابوو پیاوی ئایینی حسابێکی وای بۆ نەدەکرا، چونکە ئیسلامی کاریگەرییەکی وای نەبوو، تەنها لەنێو توێژێکی رەوشەنبیران قەتیس مابوون، تەنانەت لە چوارچێوەی ڕێکەوتنە نهێنیەکانی عیراقی وئیرانی  ناوی خمینی ومەترسیەکانی نەهاتبوو، ئەوکاتی خمینی لە عیراق بوو ، لەکاتێکا لەپرۆتۆکۆلی یەکەمیان لە تاران لە 15ی ئادارودوەمیان لە 1975/5/20لەبەغدا لەبارەی

ئاسایشی هاوبەش دەبەستریّت ، لەسەر ئەو بنچینەیە پرۆتۆکۆلی ژ:3 تایبەت دەکریّت بە ئاسایشی سنورکە پیّکهاتوە لە دیباجەیەك و8 مادەو لە 1975/6/13 لەلایەن هەردوو وەزیری دەرەوەی عیراق و ئیران مۆر کرابوو **دژی شیوعیەت وجوداخوازان بوە مەترسی خمینیان نەبوە،لە یادەوەرەکانی سەرۆکانی ئەمریکاش ئەو مەترسیە بەدی نەکراوە ، ئەوکاتی ڕابوونی چەپی زیاتر جیّی مەترسی بوە** ، ڕابوونی ئاینی بەرامبەر ئەو ڕابوونە فکریەی چەپی و نەتەوەگەری گەلی لاواز بوون، فکری خومەینی لەگەڵ ئەو بنەمایانەی(کە پەیوەندی نیّودەوڵەتی لەسەر داڕژراوە) ناتەبا بوو، وولاتانی عربی دوو بەش بوون ،وولاتانی کەنداو میسرو مەغریب و لایەنگیری شای ئیران بوون، ریکخراوی فلستین ولیبیاو سوریا هەلویستیکی تریان هەبوو ،عیراق تایبەت بوو ، بەگشتی بارووددۆخی جیهانی کە ئەو شۆرشەی لیّ خولّقا زۆر ئالّۆزو بیّ ئومیّد بوو بۆ ئیسلام لە هەموو بوارەکانی فکری-سیاسی- کۆمەلآیەتی- فەلسەفی- یاسایی- میللی ...، جیهان دابەش ببووە دوو جەمسەری شیوعیەت و سەرمایەداری، یەکەم جولانەوە بوو لەو سەردەمی بتوانی بە ڕاستی بەدروشمی نەرۆژهەلاتی و نەرۆژئاوایی(لا شرقی ولاغربی) سەرکەویّ،لە چوارچیوەی جەنگی سارد جیهان بۆ رۆژهەلات ورۆژئاوا دابەش ببون،تەنانەت ئەوانەی پیّیان دەووتراوولاتانی بیّلایەن (دول عدم انحیاز ) هەبوو بەلام ئەوانیش دابەش ببون ،بۆیە ئەو سەربەخۆییە لە ڕەوت وسەرکەوتن دەگمەن بوو .

جیهانی موسڵمان نشینیش لە نیّوان ئەو دووبەرەیە بوو زیاتر مەیلیان بەلای ئەمریکاو رۆژئاوا بوو ,لە ناو فەرهەنگی شیوعیەکانیش هەر بزووتنەوەیەك ئەگەر مارکسی نەبووایە بە (رجعی)حیساب بوو, جموجۆڵی ئیسلامی زۆر سست بوو تەنها لە نیّوکۆمەڵیّك ڕەوشەنبیری ئاینی وکونجی مزگەوت هەبوو , پیّکهاتبوو لە (ئیخوان),(حزب التحریر),(حزب الدعوە),(جماعە باکستان)..،بەلاّم ماوەیەکی زۆر بوو نەیدەتوانی ئەو تەوقانەی دەوری بشکیّنیّ لە مزگەوتەوە بیّتە سەر شەقام,بەشیکیان چالاکی سیاسی نهینیشی نەمابوو،لەوانە ئیخوانی عیراقی ، کۆمەڵیّك کەسایەتی وەك( ابوعلی المودودی, نوسینەکانی محمد باقر صدر, د. علی شریعتی, مدرسەی ئیخوان,شیخ سعیدی نەوڕەسی ... ) ووتارەکانی (شیّخ عبدالحمید کشك) لە گۆڕەپان هەبوون, هەرکاتیّك بعاتبوونایە مەیدانی سیاسی ئەوا تۆمەتی (کریّگرتەی ئەمریکی) پیّوە لکابوو, لە فەلسەفەدا بە میسالیەت (ئایدیالّ)لە قەڵەم درابوو,لە کۆمەلایەتی بە رەجعیەت و.. لە سیستەمی ئابووری بەسەرمایەداری حیساب بوو, لە

بوارەكانی تر بە قۆلی پینجەمی سەرمایەداری وبرجوازی و گەڕانەوەی سەدەكانی ناوەڕاست و ... هەژمار دەكران, زۆربەی رۆشنبیران سەر مەدرسەی ماددی بوو كەمتر باوەڕی ئاینیان مابوو، بۆیە دیاردەی (مشروب)و (سفوری)و (تێكەڵی)و علمانیەتی سەرانسەری ژیانی تەنیبۆوە، ئیسلام لە سیاسەت لە شیوازی (ریكەوتنی مۆسۆلینی-پاپا)دوور خرابۆوەە ، مزگەوت جێوڕێی سۆفی و پیرە پیاوان بوو، هەروەك لە زۆربەی شیعرو پەخشانەكانی نویژ وئاین بوە مولكی فەقیرحال ودواكەوتە (ئەزیزم بە یانا كە گوڵ عەتر دەرێژێ, كە بوولبول دەناڵێ كە سۆفی دەچنە نوێژێ)... تەنانەت جیمی كارتەری سەرۆكی ئەوسای ئەمریكی لە یاداشتەكانی خۆی دەلێت كاتێ باسی مەترسی مەلایەكانی ئیرانم كرد بۆ شای ئیران ئەو بەخیرایی هاتە سەرباسی شیوعیەكان و مەترسی ئەوان پێی وانەبوو ئاین لەو ئاستە بێت شۆڕشی پێبكرێت یان مەترسی بێت لەسەر سیستەمی شا، راپۆرتیكی سیای ئەمریكیش لەوكاتی لەمانگی ئاب دەرچوو هەمان بۆچوونی شای ئیرانی هەبوو[1059] .

شۆرشی ئێران لەكاتێكا هات هەردوو مەزهەبی سونەو شیعە دواكەوتووبون ،سونە دژی سیاسەت بوو ،دژی شۆرش بوو ..لەفكری شیعەش شۆرش نەبوو چاوەرێی (مهدی )ئینجا شۆرش و دەوڵەت دروست بكەن...لە پێش تر ولەدوای رووخانی خەلافەت تەقەلاّ هەبووە, لە ڕاستیدا وولاّتانی موسولّمان نیشین بوونە چەند بەشێك:

1-بەشی هەرە گرنگ و چالاكیان لەگەڵ تەیارە عەلمانیەكان لە چەپ و نەتەوەیی و سۆشیالیستی و لیبرالّیەوە بوە ،ئیرانیش لەو پۆلە بوە .

2-بەشی جەماوەرە كە جۆرە تەریقەیەكی وەك ئاینی مسیحی تەنیا نوێژوو رۆژی خوا بكا...هەقی نیە .

3-بەشێكی كەمی رەوشەنبیری ئیسلام لە تەقەلاّی بیّ ووچان بوونە بۆ گێرانەوەی ئەو خەلافەتە لەكوردستان تەقەلاّكانی (سعید نورسی, شێخ سعیدی پیران، .... )،لە هەموو وولاّتان ئەو تەقەلاّیە هەبوو تەیاری ئیخوان, جەماعەی پاكستان دوای لە پەنجاكان (حزب التحرير) كە سیّ قۆناغی دانابوو بۆ سەركەوتن جاری خەلافەت هەرقۆناغەو 15ساڵ ،.. هەندیّ بزوتنەوەی تر هەبووە بەلاّم بەگشتی زیاتر فكری ئەو سەردەمەی بەسەردا زالّ بووە،بریتی بوە لەكاریگەری كێشە نەتەوەییەكان, بەتایبەتی

---

[1059] مذكرات جيمي كارتر- ت:شبيب بيضون ص112-113.

لەو کیشانەی کە لەگەڵ غەیرە ئیسلام, وەك فلستین, یان هندیان موسولمانانی سۆڤیەت .., پیشوو تریش شۆڕشەکانی سەرووی ئەفریقای عمرمختار لەلیبیا ،عبدالقادرالجزائری /مەهدی لەسودان ،ئۆرشی بیست لەعیراق و شۆرشی 1919 لەکوردستان ،بەشیك سەرکەوتوو نەبو ، ئەوەی سەرکەوتووش بوو دەولەتیکی سیکولاری لێشین بوو ، بزوتنەوەی نەتەوەیی ئیسلامیش هەبوووەك نمونەی پاکستان بە سەرکردایەتی (محمد علی جناح)تەنها داوای وولاّتێکی سەربەخۆی لە هند دەکرد، داواکەشی هاتە دی لە ئابی 1947 کەچی کۆمارێکی ئیسلامی یان ئیماراتی دروست نەکرد.

<u>باری ناوەخۆیی ئیرانی:</u> لەدوای هاتنی عەلمانی وفکرو ئەزمونی عەلمانی بۆجیهانی ئیسلامی گۆڕانکاری زۆر گەورەی دروست کرد،چونکە لەکاتیك بوو رۆژئاوا بەهێزو جیهانی ئیسلامیش لاواز،بەتایبەتی لە هەردوو مەلبەندی خەلافەتی سونە لە ئەستەمبۆل وخەلافەتی شیعە لە تاران ،هەردووکیان دارووخان ولە جێی ئەوان عەلمانیەت دروست بوو ، لە نێو عوسمانی بوە دابەشی و هەلوەشانەوەی خەلافەت ودوایش دوورخستنەوەی ناوەڕۆکی ئاین تاڕادەی گۆڕینی پیتەکانی ئیسلام .

لە ئیرانیش تەیاری ئەوە هەبوو ئەو دەستکاریانە بکا تا رادەی گۆڕینی پیتەکانی ئیسلام وەك تورکیا بۆ لاتینی وتەواو بەرەو ئەوروپیانە ، لە سالی 1905بزوتنەوەی دەستوری سەری هەلدا وەك ئەوەی ئیتحادیەکان چیان بە ئاین کردلە نێو عوسمانی ، چەند جاری تر ڕاپەڕین وشۆڕش لە ئێران ڕوویدا (بە ترازێکی نا ئیسلامی) بوە لە 1906 و1911 وشۆرشی دەستوری و تا 1925 دەسەلات کەوتە دەست بنەمالەی پەهلەوی بە دیکتاتۆریانەی سەردەم، دوای شای ئیران زۆر زال بوو بەهۆی دەزگایەکی ساواك(کورت کراوەی: سازمان امنیت واطلاعات کشور )ی بەهیز .

ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو تادوای جەنگی جیهانی یەکەم ،شای ئیران بریتی بوو لە براگەورەی پادشاومەلیکەکانی ناوچەکەو عربی ،لەهەمان کات رۆلی ئەوەشی دەبینی وەك مەرجەعی سیاسی شیعەکان دەردەکەوت ، بەو شێوەیە شای ئیران لەناو مەرجەعیەکانی دەرەوەی ئیران ڕای خۆی هەبوە ،هەتا لەدیاری کردنی مەرجەعیات ،بەپێی هەندی تویژینەوە یەکلابوونەوەی مەرجەعی بالا بۆ (محسن الحکیم)لەلای شاوە هات ، کاتێ شای ئیران بە بۆنەی وەفاتی (ئایەتوالله بروجەردی) شای ئیران

بروسكەی بۆ (محسن حكيم)نارد كۆتایی بە مەرجەعیەتی هاوتای (ا عبدالهادی شیرازی) هینا كە زانایانی ئیرانی دەیان ویست ئەو ببتێ[1060].

شانبەشانی ئەوانەش جارجار تەیاری رەسەن هەولی گۆڕینی سیستەمی شایەتی داوە ،لە هەموان گرنگ تر ڕاپەڕینی موسەدیق بوو لە 1961 بەهاوكاری ئایەتولا كاشانی ،لە(1964/11/4 م)خمینی دوورخرایەوە لە ئیران بەهۆی ئەوەی نارەزابوو بەرامبەر یاسای (الكابیتالسیون) تیایدا راویژكارانی ئەمریكی كەوتنە دەرەوەی سیستەمی قەزای ئیران ، دوورخراوە بۆ نەجەف ، ئەو خەباتە بەردەوام بوە دژایەتی شاو پەیوەندیەكانی بە رۆژئاوا، بە پێی هەندێتوێژینەوە **یەكەم بناغەی شۆرش لە گەل دروست كردنی**(مجمع العلماءالمجاهدین)لە ناوەڕاستی 1979 ،كە پیكهاتبوو لە(بەهەشتی –رافسنجانی –مرتەزاموتەهیری-مهدوی كنی-محمدموفەتیح-محمدجوادباهنر-هادی خسرۆ شاهی-علی اكبر ناتق نوری-مهدی كروبی ..)[1061] ئیتر نۆرەی خۆپیشاندان وشۆڕش دەست پێدەكات لە بڕگەی داهاتومانە .

<u>خۆپیشاندان وشۆڕش</u>

بەهۆی گۆڕانكاری لە ڕەوتی زانستی وئینجا لقەكانی تری فكری وفلسفی بەرەبەرە بارودۆخ گۆڕا تەیاریكی عەقلانی بەرەو ئاین لاربۆوە ، لە مەسیحیەتی سەردەمداعەقلانیەت بوە ڕابوون لەسەرخۆی ،هەرلەوە رۆسۆ دەلێت ئاینی مسیحی تەنها باسی ئاسمانە باسی كێشەی زەوی تێدانیە ،دەشلێ بۆدروست كردنی كۆمەلگەیەكی بێدەنگ واچاكە هەموی مسیحی بن[1062] ،كەچی لە ئیسلامدا عقلانیەت دەبێتە ڕابوون بۆ خۆی ، علی عزت بیگۆڤیچ لە كتیبی(الاسلام بین الشرق والغرب) ئەوەی ساغ كردۆتەوە كە بۆچی زیاتر ئیسلام ئەو نوینەرایەتیەی تەواوی ئاینی بە ئەستۆ وەرگرتوەو دەلێ ، سۆشیالیستی لە بنەچەدا لە یەهودی نزیكە لیبرالیش لە مەسیحیەت ، یهودی (السن بالسن ... توندە)سۆشیالیستی و مركزی هینادی ، مسیحیەتیش (السن بالعفو- ..نەرمە)لیبرالیەت-دیموكراسی

---

[1060] بۆ رۆلی شای ئیران لة دیاری كردنی مةرجةعیات بڕوانة: رشیدخیون- لاهوت السیاسة ص37 .

[1061] د علی اكبر ولایتی موسوعه الاسلام والایران ص307 .

[1062] روسو – فی عقدالاجتماعی ص208

هینادی ، بەهەمان شێوە وەرگێڕی کتێبی (رساله فی لاهوت والسیاسه - سپینیوزا)دەڵێ : ئاینی یەهودی Theses چونکە ئاینێکی تایبەتە و تەنها بەرژەوەندی یەهود,ئاینی مسیحی دژی unti Theses ئاینێکی گشتی بێ ،کە ئیسلامیش هات ئەوا syn Theses بەلام ئیسلام هەردووکیانە[1063]: (مهمیناً).

بۆیە ئاینی ئیسلام مدرسەیەکە بەبێ هاوبەش لەبەرامبەر لیبرالیەت وسۆشیالست و شیوعیەت, کەچی مسیحیەت و یهودی و ئاینی تر لەگەڵ ئەو مدرسانە پێکەوە یەکتریان تەواو کردووە .... بێ پینەو پەرۆ..لەو قوولاییە شۆڕشی ئێرانی بەرجەستەی (لاشرقی ولاغربی) کرد، زەمینەی فکری لەپیش جیهانی ئیسلامی لە ئێران سازابوو .

لەلای دەسەلاتی شای ئێرانیش ماوەیەك بوو دام و دەزگای ڕاگەیاندنی لەدژی خومەینی و جم وجۆلەکانی زانایانی ئاینی ووتاریان بڵاو دەکردەوە، بەتایبەتی ووتایکی وەزیری ڕگەیاندن لە رۆژنامەی(ئیتلاعات) لە1978/1/7 بەناونیشانی( ایرن والإستعمار والأحمر والأسود) بلاوکردەوە، تیایدا ستایشێکی زۆری بەرنامەکانی شای ئیرانی کردبوو و وەسفی (خمینیش)ی بەلایەنگری دەرەبەگ ودژبە چاکساز کردبوو ، بوە هۆی خۆپشاندانیك لە 2ی کانونی دوەمی 1978لەحەوزەی قوم ،ئەو سەربردەیە لە دیباجەی دەستوری ئیران واهاتوە ( في السابع عشر من شهر (دي) سنه 1356 هـ. ش (7 يناير 1978 م) نشر النظام الحاكم مقالة أهان فيها علماء الإسلام وخصوصاً الإمام الخميني، مما أدى إلى تعجيل الحركة وإثارة غضب الشعب في جميع أرجاء البلاد..)، دوای خۆپیشاندان بە بۆنەی چلەی شەهیدانیان پەڕیەوە زانکۆی تەورێز، ئەوکاتی خومەینی لەنەجەف بوو، خەریکی کاری ئایینی خۆی بوو، بەڵام هەڵوێستی سیاسیشی هەبوو لەدژی شای ئێران پیاوێکی زۆر خۆنەویست و ڕەق بوو لەسەر مەبدەئەکانی، بۆیە ئەو گڵپەیەی شۆڕش کە لە قوم وتەورێز دەستی پێکرد پەرەی سەند بەرەو تاران و شارەکانی تریش بەپێی بوونی ناوەندە ئایینییەکان، ئەو شۆڕشە هەر لە سەرەتادا دروشمی ئاینی و داوای خومەینی کردن و دروست کردنی حکومەتی ئیسلامی و کار بە شەریعەتی ئیسلامی کردبوو،بەلام بە دروشمی چاکسازی دەستی پێکردیەکسەرداوای رووخانی شای نەکرد، لەکۆتایی

---

[1063] سبينوزا –رسالة فى اللاهوت والسياسة ،ترجمة:د حسن حنفى،دارالطباعة–بيروت،ط1 ص100

گەشەکردنی لایەنە عەلمانی و سیاسیەکانی تریش بەشداریان کرد، گرنگترین قۆناغەکانی گەشەی ئەو شۆڕشە :

+ئەوە بووە هۆی خۆپشاندانیك لە 2/1/ 1978 یەکەم خۆپیشاندان لە قوم دەستی پیکرد.

+گەیشتە زانکۆی تەورێز و دوای پەڕیەوە زانکۆی تاران .

+لەسەرداوای شای ئێران لە مانگی تشرینی 1978 خمینی لە نجف دەرکرا لەلایەن حکومەتی عیراقەوە ، چوە کویت وەرنەگیرا،چوە تورکیا وەرنەگیرا چوە پاریس، لیدوانیکی دا و ووتی : ئەگەر مالم تەنها لە فرۆکەخانەکان بێت واز لە دۆزی هەقی ئێران ناهینم ، زیاتر کاری کردە سەر شۆڕش وخۆپیشاندانی ناو ئیران .

+لە 7ی ئەیلول شای ئیران بەفەرمی وولاتی خستە دۆخی تەنگەتاوی(حالة الطوارىء) وکوشت وبڕ دەستی پیکرد.

+ چەند جاریك حکومەت لەتاران گۆڕا وتا بوە سەربازی بەسەرۆکایەتی جنرال زاهدی .

+لە 1979/1/16 شا ئێرانی بەجیهیشت ، حکومەتیکی بە سەرۆکایەتی شاپوربختیار پیکهینا کە پێشوو تر ئۆپۆزیسۆن بوو ، جلال تەهرانی(بە سەرۆکی ئەنجومەنی وسایە دیاری کرا لەلایەن شاوە) بەوەفدیکی فەرمی بەرەو پاریس بەڕێکەوت بۆ دیدەنی خمینی ودەست کردن بە دانوستان،بەلام خمینی رازی نەبوو بیبینی هەتا لە پۆستەکەی واز نەهێنێ چونکە (خمینی ووتی) شای ئیران خۆی شەرعی نیە سەرۆکی ئەنجومەنی وسایەش شرعی نیە .

+ لە1979/1/14 جیمی کارتەری سەرۆکی ئەمریکا پەیوەندی بە جیسکاردیستانی سەرۆکی فەرەنسا دەکات بۆ ئەوەی بتوانی خمینی تاخیربکات ونەیەلی بگەریتەوە ئیران تا حکومەتەکەی شاپوربەختیار بەهیزتر بیت ، سەرۆکی فرنساش دلنیای دەکاتەوە دەلیت واپیدەچی خمینی لەو کات وساتە نەگەریتەوە ئیران [1064].

---

[1064] مذکرات جیمی کارتر- ت:شبیب بیضون ص119.

+خمینی بڕیارێکی زۆر پڕلەناکاو و موجازەفەی داو ووتی دەگەڕێمەوە ئیران و لە رۆژی 1979 /2/1 لە پاریس گەڕایەوە ناو ئیران .شاپور بەختیار پێی وابوو بەگەڕانەوەی کۆتایی بە کاریزمی خومەینی دێت .

+یەکسەرلە 3ی مانگ(5ی مانگ) حکومەتیکی بەسەرۆکایەتی مهدی بازرگان(سەرۆکی بزوتنەوەی ئازادی) پێك هیناو لە ناو ئیران دوو حکومەت بەڕێوە دەچوو،ئەوەی تر بەسەرۆکایەتی شاپور بەختیار .

خۆپیشاندانی ملیۆنی سەرتاسەری ئیرانی گرتبۆوە .

+لە 1979/2/11 یاخیبوونیك لە هیزی ئاسمانی ئیرانی ڕوویداو سوپا زۆربەتوندی لێیدان ، بەلام سەرکوت نەکران وخۆپیشاندانی مەدەنی لەوێوە وەرچەرخا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری ،لە دوا ساتەکان فەرمان بە سوپا کرا بکشینەوە سەربازگەکانی خۆیان ، هەر ئەو شەوە تەواوی تاران کەوتە دەست شۆڕشگێڕان، دوای هەمو شارەکان .

_ تا لە 11/کانونی یەکەم،1979 بەتەواوی سەرکەوتن .

لە کۆتاییدا لە 22بەهمەن –1979/2/11, شۆرشی ئیسلامی سەرکەوتوو بوو, شایی پیّ رووخاو قۆناغێکی نوێی میژووی ئیران وناوچەکە دەست پێدەکاوکۆماری ئیسلامی ئیران دروست بوو بە ڕاپرسیەك تیایدا دەنگی 2، 98٪ هێنا .

**کاریگەرییەکەی**(تصدیر الثورة): جاروایە خودی بنەمای شۆڕش هێزی تەنینەوەی تێدایە بەلام وەك پالپشتی ئەکادیمی زیاتر لە یەکەم ووتاری خمینی باسی لەوە کرد کەحکومەتی ئیسلامی ئێران سەرەتایەکە بۆ حکومەتی دادگەری جیهانی، ووتی رۆژهەلات ورۆژئاوا زولم لە میلەتانی موستەزعەف دەکەن و نەتەوە یەککگرتوەکانیش رۆلی بەرجەستەکردنی ئەو سیستەمەیە ، ئینجا بانگەوازی تالقانی لەگەرمەی سەرکەوتنی شۆڕش و ووتی ئەوە شۆڕشی زەحمەتکیشانی جیهانە[1065] ...ئیتر بانگەوازی ڕاپەڕینی جیهانی لەزۆر لای ترکراو بناغەیەکە بۆ (تصدیر الثورة) .

---

[1065] د وليد عبدالناصر – ایران(دراسة عن الثورة والدولة) –دارالشروق1997،ط1قاهرة ص58.

ئەوەی پێی دەووترێ مونتەلەق ومەدای شۆڕش زانستێکە لە کاریگەریەکانی شۆڕش دەکۆلیتەوە ،شۆڕشی فەرەنسا 1779کاریگەریکانی کەوتە سەر چەند میللەتێك, شۆرشی ئۆکتۆبەر1917ی روسیا بە سەرۆکایەتی لینین بەهەمان شێوە هەندێ شوێنی گرتەوە هەندێ شوێنی نەگرتەوە, لە بوهاری ئەوروپی لە کۆتایی سەدەی بیست و لە 1989تا 1991 هەموو ئەوروپای نەدەگرتەوە, دەتوانین بلێین ئەوروپای رۆژهەلاتی دەگرتەوە، هەرچی شۆرشی ئیسلامی ئێرانە لە 1979 ئەویش ئاستێك لە میللەتانی دەگرتەوە بریتیی بوولە بەرپاکردنی ڕابوونی ئیسلامی دروست بوونی بزوتنەوەی ئیسلامیەکان,...مەدای شۆڕش مانای (تصدير الثورة) نیە وەك ئەو کاتی وانیشان درا، بەلکو سروشتی شۆڕشەکە وایە ، هەموو جیهانی لە زۆرداران بەخەبەر هێناوە سەلماندی یەوە کە هێزی جەماوەر لە تەکنۆلۆجیای سەربازی بەهێزترە، ئەوشورشە جموجۆڵ و ڕابوونێکی فراوانی خستە ناو جیهانی ئیسلامی، چونکە چۆنایەتی شۆڕشەکە زۆر جۆشدەر بوو، بۆیەکاریگەریەکانی هەمەلایەن و ئەوەندە زۆرە ناژمێردرێت وەك یاسر عەرەفات ئەوکاتی وەسفی کاریگەریەکانی بە (جهان لەرزین) کرد،(زلزلە هزت عروش الملوك)،مەلامستەفای بارزانیش وەسفی بە(موعجیزە)کرد،بارودۆخی جیهانی و ئیقلیمی و ناوەکی گۆڕی، یەکەم جاریش بوو شۆڕشێکی جەماوەری بەسۆز بەناوی ئیسلامی ئاوا سەرکەوێ بێئەوەی پاڵ بداتە ڕۆژهەلات یا ڕۆژئاوا، لە ڕاستیدا شۆرشی ئێران هەر شۆرش نەبوو لە سەر شاو قەلای ئەمریکا...شۆرش بوو لەسەر زۆربەی سیستەمی جیهانی و فکرو فلسفەو...پیشوو تر بزوتنەوە ئیسلامیەکان رۆژئاوایان بەو ڕادە بەدوژمن هەژمار نەدەکرد بەلکو شیوعیەت و سۆڤیەت ، وای لیهات منافسەی (3) مەدرەسە عەلمانیەکەی کرد وبوە مەدرەسەی چوارەم (لیبرالی- سۆشیالیستی- شیوعی –ئاینی) ،،لەدوای ئەو شۆرشە ئەو هاوکیشە وەرگەڕاو ئەمریکاو رۆژئاواو ئیسرائیل بەدوژمنی یەکەمی ئیسلام هەژمارکرا . لەدوای سەرکەوتنیش سەرکردەو ڕابەرانی شۆڕشی ئێرانی بەدوای ژیان و خۆشگوزەرانی نەبوون، یەکسەر ڕوویان لە کێشە نادادگەری یەکانی جیهان کرد ،شۆڕشی ئەڤغانستان سەرەتا بوو زیاتر ناوەڕۆکیکی نیشتمانی هەبوو ، وەرچەرخا بۆناوەڕۆکی ئیسلامی و زیاتر تەقی یەوە، لە تورکیا لە عێراق لە ولاتانی عەرەبی ... هتد خوارووی ئاسیاشی گرتەوە، زۆربەی شۆڕش و بەرگری یە میللی یەکانی داگیرکەرانیشی گەشاندەوە، بەرگری فەلەستین، مۆرۆ، کشمیر، خوارووی لبنان.. زۆر گەشەی بە شۆڕشی کوردیش کرد، ...و کێشەکە لە نێوان

میللەت و دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆری بوو ... زاراوەی وەك (ئوسولی، تزمت، تیرۆریست، ئیسلامی، ... ) لەگەڵی پەیدا بوو، لە بەرامبەریشدابەدەیان کۆبونەوەی ڕەسمی و نارەسمی سازدرا، لەهەمووی گرنگتر لە نێوان ئەمەریکاو ئیسرائیل کۆمیتەیەکی باڵای هاوبەش پێکهات بەناوی (کۆمیتەی گشتی هاوبەش ) بەدەیان سەنتەری توێژینەوەی لەبەردەست بوو، بە هاریکاری هەندێ وولاتانی ئیسلامی کاریان لەسەر زیندووکردنەوەی جیاوازی مەزهەبی وەك شیعەو سونەو ئیسلامی سیاسی وناسیاسی و ...پەیداکرد، بەو شێوەیە تا ڕادەیەك توانیان پێش لەو شەپۆلە بگرنەوە، بەڵام هەر کاریگەری یەکەی بەردەوام بوو هەتا ئەو ساتەش، لەکاتێکا جەنگی عێراق و ئێران بەردەوام بوو بۆ بەرگرتنی ئەو ( تصدير الثورة ) دەبینین پەڕ یەوە ئەڤغانستان بەرەو رۆژهەڵات لەولایەش پەڕی یەوە وڵاتانی عەرەبی و سودان و جەزایرو تونس، .. تا لەنێو تیاری سێیەم بە ناوی ( سەلەفیەت) لەناو ڕابوونی ئیسلامی دروست کرا، کاریگەری یەکی لەهەموان زیاتر لەو ڕابوونەکردو کومەلیك جیاوازی نوستووی بەخەبەر هێنایەوە، ئیستا ئەوڕابوونە لە تەنگەبەریدایەو وەرچەرخاوە بۆ کیشەی سونەو شیعە .

دوای بە ڕاشکاوانە تر لەلایەن وولاتانی عربی لە کۆنگرەی سەرانی عەرەبی لە عەممان لە کۆنگرەی عەمانی ساڵی 1987 بەتێکڕای دەنگ (جگە لە لیبیاو سوریا) ئێران مەترسیە نەك ئیسرائیل.

کاریگەری لەسەر کورد: بە پێی مونتەلەق ومەدای ئەو شۆڕشە(کە زۆر پەیوەستیشە بە ناسنامەی شۆڕش) دەبوایە زۆر بەدرەنگەوە بگاتە بەشەکانی تری کوردستان، بەلام بەهۆی ئەکتیڤیایەتی میلەتی کورد بەگشتی (لە چاو میلەتێکی بیدەولەت) زۆر دوا نەکەوت، لەکاتی شۆڕشیش شارەکانی کوردستانیش (مهاباد-سنە – کرمانشا..) بەشداریان لە خۆپیشاندان کرد،لەلای کوردستانی باشوریش زۆر بەخێرایی بزوتنەوەی کورد گرنگی ئەو شۆڕشەی زانی، بۆیە مام جەلال بەڕەسمی نامەی بۆ (أ.خمینی) نارد، ئەوکات لەپاریس بوو، تیایدا هەموو هێزەکانی (ی ن ك) ی خستە ژێر فەرمانی ئەو، تا سەرکەوتن هەمو لایەك بەشداریەکی چالاکانەیان کرد.

دوای سەرکەوتن کاریگەریەکانی شۆڕشی ئیران لەسەر کورد لە چەند لایەکەوە دەرکەوت، بەلام مەرجیش نیە هەموی ئەرینی بێت ، هەندیکی لە چوارچێوەی (مونتەلەق ومەدای)شۆڕشەکە

بو،ئەوەیان گشتیە ،تایبەتیەکەی وکاریگەریە ئیجابیەکانی لەڕێی کاریگەریەکانی لەسەر عیراق دێت وهاتوە ، چونکە لەهەموان زیاتر کاری لەسەر عێراق کرد، ، نزیکەی 3 بەشی عەرەبی عێراق هەست و نەستێکی نوێی بۆ دروست بوو، نەخشەی ئینتیمایەکانی گۆڕی، بەو شێوە هەم سیستەمی سیاسی عێراق و هەم سیستەمی کۆمەڵایەتی عێراقی کەوتە مەترسی، خودی عیراق کەوتەوە دیزاینیکی نوێی سیاسی وکۆمەلایەتی لە قازانجی سیستەمی عیراقی ودەسەلاتی کەمایەتی وحزبی بەعس نەبوو ، چونکە ئەو گۆڕانکاریە ئەوەندە قوولە ژێرخانە سایکس پیکۆییەکانیش دەگریتەوە ،لە سایکس پیکۆو دروست بوونی عێراقەوە نەخشەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ژێر سایەی (ڕابوونی نەتەوەیی)وا دروست ببو کە تیایدا 74٪ عەرەب و 22٪ کورد و ئەویتریش کەمایەتی، لەو نەخشەیە بە سوننەی عەرەب کە رێژەیان لە دەوروبەری 22٪ خۆیان شاردبۆوە لەنێو دوو هاوکێشەی ڕەگەزی و تایفی، کاتێ ڕەگەزی بوایە ئەوا وەك عەرەب زۆرایەتی بوون بەرامبەر کورد، کاتێ تایفی و مەزهەبیش بوایە لەگەڵ کورد زۆرایەتی پێشان دەدرا بەرامبەر شیعە. لە هەردوو باریشدا بە سەرۆکایەتی سوننەی عەرەب(بەرگی عروبی) تەواو دەبوو، زۆربەی جیهانیش بەرژەوەندیەکانی بەو نەخشەیە بەند کرابوو ، ببوە کۆنکریتەك جولەی لە ژێر نەمابوو، کورد لەو نەخشەیە خنکابوو،شۆرشی ئیران ئەو نەخشەیەی ژێراو ژوور کرد ،دیزاین ونەخشەیەکی کۆمەلایەتی نوێی وئەکتیڤی بەو جۆرە داڕشتەوە : لە ٪24 سوننەی عەرەبی دەسەڵاتدار لە ٪55 شیعە،لە ٪22 کوردباقیەکەی تر کەمایەتیەکان، هەر لەوەوەیە تائیستاش دەستکەوت بۆ کورد دێتە دی ، دەرکەوت کورد کیشە نیە بەلکو عیراق خۆی کیشەیە . دەولەتی عیراقی هەر زوو هەستی بەو مەترسیە کردو زانی قۆناغیکی نوێ بۆ ناوچەکە هات ،( صدام حسین) خۆی بۆ ئەو پیشهاتە ئامادە کرد، لەسەرەتادا( أحمد حسن البكر ) ی لە سەرۆك کۆماری دوور خستەوە ، خۆی جێ ی گرتەوە، کۆمەڵێك سەرکردەی حزبی بەعسیشی لە سێدارە دا، لەگەڵ چەندین پالنەری ناوەکی ترو ئیقلیمی و دەولی بە دەست لەپشتدانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو زۆربەی ڕژێمە دژ بە میللەتانی ناوچەکە عیراق بەرەو ڕووبەڕووبونەوەی ئیران وئەو پیشهاتانە بوونەوە [1066]، تا بەهەموو لایەك جەنگی عێراق دژی ئێرانیان سازدا کە لە نزیکەوە دیوارێکی

---

[1066] بۆ زیاتر لەبارەی رۆلی ئەمریکاو وولاتانی تر بڕوانە: وفیق السامرائی -حطام بوابة الشرقية ، هەروەها بڕوانە : مجدى كامل- الحكام العرب فى مذكرات زعماء وقادة ورجال مخابرات العالم ص327.

پۆلاینی لە پێش ئەو شورشە دروست بکا، یەکەم هەنگاو بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنەکەی جەزائیر ی 1975 لە ڕۆژی 17/9/ 1980 دەستی پێ کرد ، دوای لە 1980/9/22(صدام حسین) جاڕی جەنگی لەگەڵ ئێران دا، زنجیرە جەنگ وتاوانەکانی بەعس بەرپا بوو تا گەیشتە ڕووخانی ولەسیدارە دانی و دروستبوونی عیراقیکی نوێ کە تیایدا کورد پێگەی گرنگی خۆی لێوەرگرتوە .

بەو شێوەیەدەرگا داخراوەکانی سەر کوردی کردەوە، ئەو ئەڵقە خنکێنەرەی سەر کورد تۆماتیکیەن شکێنرا، هەر سروشتی شۆڕشی ئێرانی خوی وابوو، (نەك لەبەر میللەتی کورد)، بەشی زۆری بەربەستەکانی بەردەم گەشەی بزوتنەوەی کورد (خۆی لەخۆیدا)لەهەمان کاتدا ناتەباش بوو لەگەڵ بنەماکانی ئەو شۆڕشە، بۆ یەکەم جار لەمێژووی مەینەتی کورد دەوڵەتێك دروست بوو ناکۆکیەکانی لەگەڵ ولاتانی ئیقلیمی و جیهانی بەهێزتر بێت لە هاوتەبایی لەسەر حسابی کورد ، بۆیە کاریگەریەکانی شۆڕشی ئێرانی زۆر ئەرێنی بوو بۆ جولانەوەی کورد، ئەو تەباییەی شاو تورکیاو عێراق هاوپەیمانی سێ قۆڵی لەدژی هەر جمووجۆڵێك بە تایبەتی کورد هەبوو،هەرهەمووی هەلتەکا .

ئنجا کۆماریکی ئیسلامی دروست بوو پابەند نەبوو بە بنەماکانی سایکس پیکۆ،.. بۆیە دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ کورد، لەلایەکی تریش لەگەل سەرکەوتنی (خمینی) نوسینگەی بۆ زۆربەی بزوتنەوەکانی ڕزگاری خوازی جیهان کردەوە، زیاتر گرنگیشی بەکێشەی فەلەستین و کورد بەخشی، تەنها دەعوەتنانەی بۆ (سەرۆکی فەتح-یاسر عەرەفات) و(سەرۆکی کورد مەلا مستەفا) نارد، ئەو کاتی بارزانی بە بینازی کەوتبوە خەستەخانەیەکی ئەمریکی ، بارزانی پەیوەندی کۆنی لەگەل خومەینی هەبوو لە ڕێی (محسن حکیم) وسەردەمی نەجەف، بۆیە لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانی 1979،بروسکەیەکی پیرۆزبایی لە1979/2/11 بۆ خمینی نارد دەقەکەی ئەوە دەقەکەیەتی :

بسم اللة الرحمن الرحيم

حضرة ايةاللة العظمى روح الله الخمينى (ان ينصركم اللة فلاغالب لكم) صدق اللة العظيم

ان انتصار اخواننا المسلمين الايرانيي على الظلم والطغيان بزعامتكم يعتبر نصرا لجميع المضطهدين فى العالم ويعتبر بصورة خاصة اكبرانتصار للشعب الكردى المضطهد...ان الثورة الاسلامية فى ايران

بزعامتكم  التى قطعت جذور الطغيان والدسائس التى تعرض لها الشعب الكردى فى العراق تعتبر معجزة خارقة للعادة ..وبهذه المناسبة التاريخية اتقدم بالتهنئة اليكم وللحكومة الاسلامية وللشعب الايرانى المسلم وادعوالى الله التعالى ان يوفقكم ،واتمنى ان يتمتع الشعب الايرانى المسلم بأخية ورضاء الله وان يستقر العدل الربانى فى ايران بدلا من التعسف والانانية ،نهنىء الثورة الاسلامية من صميم قلوبنا ونأمل ان تعتبرونا جزء من المجاهدين فى هذا الطريق المقدس ..وسلام اللة عليكم ورحمة وبركاتة

اخوكم    مصطفى بارزانى  11/2/1979

**له** وەڵامی پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕش (أ. خمینی) داوای له (بارزانی) کرد بگەڕێتەوە ئێران، بەڵام پێڕانەگەیشت، له 1979/3/1 کۆچی دوایی کرد، ئەگینا بزوتنەوەی کوردایەتی جۆرە ڕەوت و واقعێکی تری دەبوو جیا له ئێستا، بەپێی ووتارەکەی کاك مەسعود له3/5/ 1979 دەڵێت: مردنی بارزانی سروشتی نەبوو، بەڵکو بەدەستی ساواك و سیای ئەمریکی بارزانی شەهید کرا.[1067]، ئەوانە هەمو لەکاتێکا بوو بەبۆنەی یادی سەرکەوتنی شۆرشی ئیران  له عیراق چوار سەرۆك و بروسکەی پیرۆزبایی نارد،لەلایەن (احمد حسن البکرسەرکۆماری عیراق، ملا مستەفا، جلال تالەبانی، مسعود بارزانی، ئیدریس بارزانی، محمد باقر الصدر) ، ئەوەی خوارەوە دەقی بروسکەکەی بارزانیه بۆ خمینی تەنها وه لاٚمی بروسکەی ملا مستەفا و محمد باقر الصدری داوه بەئیجابی، وه لاٚمی بروسکەکەی (احمد حسن البکر _ کۆماری عیراق) به (السلام علی من اتبع الهدی) دایەوە.

ئەو وەلامە ئیجابیەی خمینی بۆ بارزانی  هەمو لایەکی کوردی خۆشحال نەکرد،بەتایبەتی ...بەشێك لەسەرکردە کوردەعەلمانیە توندەکان ، لەوکاتیەوە وەسفی سیستەمی نوێ ی ئیران به رەجعی و ئاخوند و مەلالی و... کرا، بەشێکیش پێیان وابوو ئەوە هەنگاوێکی مەزنە لەناوچەکە و جیهان وەك دەرفەت بۆ کورد هاتە پێش پێویستە بەووردی و زانستیانە بقۆزرێتەوە، دۆخێکە وێچووی ئەو دابەشیەی له نێو ریزی بزوتنەوەیی کورد سەری هەڵدا کە بەشێك پێیان وابوو لەگەڵ ئەستەنبول و عوسمانی مافی

[1067]بڕوانە ووتارەکە له نیسانی 1979، هەروەها کتێبی (ئەوەی بەعس پێی نەکرا، م.ڕەوشەن کردی) فیصل دەباغ، له بڵاوکراوەکانی (پ.د.ك).

کورد دێتە دی، بەشە عەلمانیەکەش پێیان وابوو لەگەل کەمالی، دوای لەگەل سەرکەوتنی عەلمانی و کمالی مالی کوردیان وێران کرد، لەناو ئیران عەلامە احمد مفتی زادە و هەندێ لە پەیرەوانی لەهەموان ووردتر لەوهەنگاوە ئیجابیە گەیشتوون، لەدوای ئەو شەهید د. عبدالرحمن قاسملۆش رەچاوی ئەو هەنگاوە و مانای دەوڵەتی نوێ ئیرانی زانی چیە، بەڵام باقیەکەی تر لە کۆمەڵە و مامۆستا شێخ عزالدین حسینی و هەندێ شیخی ترو بنکەکانی تری حزبی دیموکرات و زۆر لای تر لەو مانایە نەگەیشتن، ئەوکاتی لە هەموو جیهان خەڵکی لە مارکسیایەتی و چەپی و عەلمانی پاشەکشەی بوو کەچی ئەو جۆرە سەرکردە کوردانە لە گەرمەی مارکسی نقوم ببون ، بۆیە کە بینیان خومەینی زیاتر ڕووی لە بارزانیە بەرەبەرە عەلمانیەتی کورد بە بیانوی جیاجیا لێی دوورکەوتنەوە بەشیکیان بەلای بەعس ڕۆیشتن، بەشێکی تر بەهۆی جیاجیا لەدژی ئەو دەوڵەتە وەستان یان خزانە لایەنگیری حکومەتی بەعس ، هەتا ئەو دەردە (ی ن ك)یشی گرتەوە(بۆ ماوەیەك) لەدژی ئەو دەوڵەتە لەساڵی 1983 دانوستانیان لەگەڵ حزبی بەعس کرد، لە 1985/1/15 دانوستانەکە شکستی هینا،هەندێ جار هەندێ بالی بزوتنەوەی کورد یارمەتی عێراقیدا لەجەنگ(عیراقی ئیرانی ) ، حزبی بەعسیش دوایی بە کیمیایی و ئەنفال ئەو چاکەی کوردی دایەوە، ئەو تەقەلا هەلانە گەیشت بوە تەنزیر کرردن بۆ بەعس، ،بەشێك لیکدانەوەیەکی سەفسەتاییەیان هێنا ئارایەوە ،تیایدا دەسەلمێنرا کە بەعس باشترە لە ئیسلامی ئێران، دەیان ووت عێراق تەنها لەڕووی نەتەوەیی دژمانە، کەچی ئێران لەڕووی نەتەوەیی و مەزهەبیدژمانە!!، بەو مەرجەی ئەوانەش عەلمانی بوون فرپیان بەسەر مەزهەب نەبوو، وە وتیان مادام بەعس سۆشیالیستیە هەر نزیکترە لەئێمە..!

بەهەرحاڵ دیسان کورد نەیتوانی وەك پێویست سود لەو کاریگەریە زۆر ببینێ، بەڵام کاریگەری سروشتی ئەو شۆڕشە وایە هەتا کاریگەری بەهێزتر دەبوو دەرگای داخراوی لەسەر کورد زیاتر دەکردەوە، لەوەش مونەزیرانی کورد دوو بۆچوونیان هەیە :بەشیك دەلێن هەتا ئەم ساتەش هەموو ئەو دەستکەوتانەی بۆ گەلی کورد هاتۆتە دی بناغەکەی بۆ ئەو شۆڕشە دەگەڕێتەوە، بەشیکی تر زۆربەی بۆ ئەمریکا دەگێڕنەوە، بەلام ئیستا ڕوون تردەردەکەوێ بوونی دەوڵەتێك وەك ئێران بەو بەرنامەیە و بوونی حزبی دادوگەشە لە تورکیا، پارسەنگی زۆر بەهێزن بۆ مان و نەمانی کورد، جار وایە یەکلای

کردنەوەی ئەو دوو بۆچوونە لەڕێی پرسیاریکی پیچەوانە دەبیت،ئەویش ئەوەیە بەدیلی ئەوانە چیە ؟ هەلبەتە ڕوونە بەدیلیان سیستەمیکی گونجاوە لەگەل رۆژئاواو ناوچەکەو دەبتە هۆی ویفاقیکی ئیقلیمی وجاریکی تر کورد دەکەویتەوە زیندانیەکەی سایکس پیکۆ .

**کاریگەریە ئاینیەکان:** ئەو شۆڕشە لەسەرەتادا ناسنامە ئاینیەکەی ڕوون بوو ،بەپیچەوانەی ئەوڕایەی هەندیك دەلێن سەرەتا ئاینی نەبوو عەلمانی بوو ،تەنانەت لە(Encyclopædia Britannica) دەلیٚ هەتا عەلمانی وچەپەکانیش لە ژێر سایەی (الله اکبر – God is great) ڕاپەڕین[1068]،زیاتر (ئایەتوللە تالقانی) هەماهەنگی نێوان خمینی ولایەنە عەلمانیەکانی بەڕێوە دەبرد، لە کاتی بەڕێوەبردنی خۆپیشاندان وشۆڕشی ئیران لایەنە عەلمانیەکان هەندی تەقەلایان دا لە ژێر چەتری (بەرەی نیشتمانی بەسەرۆکایەتی کریم سنجابی ) کۆبونەوەو خۆپیشاندانی سەربەخۆ بکەن ، بەلام یەك لە خۆپیشاندانەکانی بەراورد ڕاستیەکانی دەرخست ،ئەوەی خمینی داوای کرد لە رۆژی هەینی بوو 2 ملیۆن بوو تەنها لەتاران بەشداریان کرد ، ئەوانی ترڕۆژی یەکشەمەیان دیاری کرد بە هەمو توانایان 100000کەسیان بۆ کۆبۆوە ، بۆیەش (مەدای شۆرش) زیاتر جیهانی ئیسلامی هەژاند ،بوە هۆی سەرهەلدانی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی(لا اخوانی)وتا ئیستاش کاریگەری جۆربەجۆری ماوە .

لە پیش شۆرشی ئیران تیڕوانین بۆ ئاین وفلسفەی ئیسلام زۆر سادەبوو لەلایەن ئەکادیمیای سەردەم و فلسفەی مارکسیزم، ئاینی ئیسلامیش وەك ئاینیکی سەلبی ورێگر لەپیشکەوتن و(تلیاکی گەلان)هەژماردەکرا، هەمو فکرو فەلەسەفەی ئیسلام لەسەر (میسالیەت) هەژماردەکرا ،گوایە ئەوەی بلێت روح پێش ماددەیە ئەوە میسالیە و پێچەوانەش بەپێچەوانەوە[1069] ، هەرچەندە لیرەو لەویٚ هەندیٚ بەرگری لە ئاستە جیاجیاکانی زانستی وفکری وفلسفی لە ئیسلام دەکرا،بەلام لە حیساباتی هیچ لایەك نەبوو ئاین لەسەدەی بیست بتوانیٚ دەولەت وشۆڕشی پێدروست بێت، ئیران بوە نمونەیەکی بەرجەستەو کۆتایی بەوە هێنا چارەسەری ئاینی لە ئاسمان بیت بەلکو هێنرا سەر زەویش .

---

1068 Encyclopædia Britannica - articl: Iranian revolution

1069 بۆدوستنیك ویاخوت- عرض موجز للمادیة الیالکتیکیة ص8 .

لەسەر ئاستی فکری وسیاسیش کاریگەریەکی بەهیزترو ڕاستەوخۆتری هەبوو ،زۆربەی ڕاڕەوی شیعە چاوەڕێی (ح مهدی)بوون شۆڕش ودەولەت و خەلافەتی ئیسلامی دروست بکات ... لەناو سوونئەش بە هەمان شیێوە لە ژێر باری جیاکردنەوەی ئاین لەسیاسەت وژیان ئاین بەتەواوی خانەنشین کرابوو ، ئەو بارو دۆخە جیهانی گرتبۆوەو هەمو ئاینەکان لەبارودۆخیکی فەرامۆش کرابوون ،لەهەندێ وولات گەیشتبوە ئاستی دەستوری ، کە ئایین نەیەتە ناو دەولەت یان ئەوەی ئیستا پێی دەووترێ( ئاینی فەرمی وولات فلانە ئاینە )،لە پیش هەموان کۆنگریسی ئەمریکی[1070] ،ئینجا لە مادەی 116ی دەستوری نەمسا ی سالە 1901،زۆر وولاتی تر یش،بەو دواییە گەیشتە وولاتانی کۆنە شیوعی ،لەوانە:مادەی16ی دەستوری بیلا روسیاسالی 1994،مادەی 11ی دەستوری ئەسیۆبی 1994،مادەی 14 ی دەستوری روسیای 1993، لەجیاتی مادەیەکی دەستوری وەك مادەی(2)ی دەستوری فرنسی تۆماردەکرا: **فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو الدين وهي تحترم كل**[1071]، لەزۆر وولاتی تر بەشیێوەی جیا وادەهات ، لەدیباجەی دەستوری هندی 1950،مادەی 8ی دەستوری ئەنگۆلیا،مادەی 7ی دەستوری ئازەربیجان ،مادەی 1ی کازاخستان،مادەی 1ی قرغیزیا،مادەی 1ی مەدگەشکەر،مادەی 1ی وولاتی مالی ،مادەی 14ی دەستوری روسیا،مادەی 1ی تاجیکستان،مادەی 20ی دەستوری ژاپۆن ، لەدەستوری تورکیاش هەر ناگۆترێ،.. لەو بارودۆخە بێئومێدیە ئەو شۆڕشە دۆخی ئیسلامی لەسەر تەنیشت وەرگێڕایەوە سەر پێی خۆی .

لە ئەفغانستان لەدۆخیکی شۆڕش بوون دوای ئینقلابەکەی(نورمحمد تراقی)دژی سەردارمحمد خان ، لەولایەش شاو تورکیاو عێراق هاوپەیمانی سێ قۆلی لەدژی هەر جموجۆلێك وڕابوونی گەلانی سەرکوت دەکرد، ئیتر ئەو شۆرشە کلیلی دەرگا قوفلێ دراوەکانی یەك سەدە بووە هەمووی کردەوە, لە

---

[1070] هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کراوە) لەبڕگەی(3)ی مادەی(6) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

[1071] دەستوری فرنسا لە4ی ئۆکتۆبەری 1958 دەرچوو 92مادە بوو.

دەسپێکردنی ئەو شۆرشە جیهان بووە سێ بەش: ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی دژی وەستان، لە ناوچەکەش وولاّتانی کەنداو سعوودیەو عێراق وئوردن و مصر دژی وەستان, وولاّتانی بێ لایەن و هەموو بزوتنەوە رزگاری خوازو میللەتانی ژێردەستە زۆر لایەنگری بوون، لەوانە هەموو باڵەکانی فلّستین, حزبە کوردستانیەکان , سوریا, لیبیا, ...

لەدوای شۆرشی ئیران کۆمەلیك زاراوە سەبارەت بە ڕابوونی ئیسلامی سەری هەلدا ،بەناوی (خومەینیە،ئوسولی، متزمت، ڕادیکال ،فوندەمینتال ، فۆبیا،تیرۆری ئاینی ،ئیسلامی ، بیداری،نەهزە،صحوە،..) ، لەلای ئیسلامیش زیاتر زاراوەی (بیداری) بوکاردەهات، لە(موسوعە کشاف)هاتوە: بەدرێژایی خەلافەتی ئیسلامی کەلتوورو ڕۆشنبیری فارسی زۆر بلاّوبوو لەناو زانایانی ئیسلام بە عەرەبەکانیشەوە، بۆیە بەڕابوون ووتراوە (بێداری) بە واتای (الصحو والیقظە)[1072]، ئەو زاراوەیە بەخەستی سەری هەلدا لەلایەن ئەهلی ئیسلامی .

**خالە لاوازەکانی :** لەرەوتی باسەکانی خالە بەهێزەکانی گوزارش کرا ، ئیستازۆربەکورتی ئەو چەندخالەی خوارەوە پووختەی لایەنە لاوازەکانیەتی لەسەر ئاستی گشتی :

- نەتەوەگەریەتی –ئیران دەولەتیکی نەتەوەگەری نیە ،دەولەتێکی نیشتمانیە هەرخودی ناوی ئیرانیش لە 1000پ زبەکارهاتوە لە (ئاریا)هاتوە لە ئاڤیستا،بەشیوەی ئاریانا لە کتیبەکانی یۆنانی رۆمانی بەکارهاتوە[1073] ،بۆیەش لە دەستوری کۆماری ئیسلامی ئیران (3)جارناوی فارس هاتوە لەمادەی (15و 16) ،بەلام نەیتوانیە میلەت وپیکهاتەکانی تری ئیرانی رازی بکا ،تەنانەت نەیتوانیە مادەی(15)ش جیّبەجێ بکات کە تاڕادەیەك مافی زمانی پیّداون،دەقەکەی: المادة(15) اللغة والكتابة الرسمية والمشتركة" هي الفارسية لشعب إيران، فيجب أن تكون الوثائق والمراسلات والنصوص الرسمية والكتب الدراسية بهذه اللغة والكتابة. ولكن يجوز استعمال اللغات المحلية والقومية الأخرى في مجال الصحافة ووسائل الإعلام العامة، وتدريس آدابها في المدارس إلى جنب اللغة الفارسية.

---

[1072] موسوع كشاف مصطلحات الفنية والعلمية ص353

[1073] تاريخ الشرق القديم ص257

- مەزهەبیەت —بەڕوونی لایەنی مەزهەبیەکەی زالە،گەیشتۆتە ڕادەی تۆمارکردنی دەستووری کۆماری ئیسلامی ئێران بە ڕاشکاوانە یەك جار لەمادەی 12 مەزهەبی جعفری هاتوە بەلام سیفەتی (صلب)ی پێداوە،ناوی شیعە نەهاتوە ،سەرەڕای ئەوەش وەك سیستەمی سعودیە تەنگەبەری بۆ مەزهەب وتایفەکانی تر دروست دەبێت ، ئەوە دەقی مادەی دوازدەی دەستوری ئێرانە : ( الدين الرسمي لإيران هو الإسلام والمذهب الجعفري الإثني عشري، وهذه المادة تبقى إلى الأبد غير قابلة للتغيير. وأما المذاهب الإسلامية الأخرى والتي تضم المذهب الحنفي والشافعي والمالكي والحنبلي والزيدي فإنها تتمتع باحترام كامل، وأتباع هذه المذاهب أحرار في أداء مراسمهم المذهبية حسب فقههم، ولهذه المذاهب الاعتبار الرسمي في مسائل التعليم والتربية الدينية والأحوال الشخصية (الزواج والطلاق والإرث والوصية) وما يتعلق بها من دعاوى في المحاكم. وفي كل منطقة يتمتع أتباع أحد هذه المذاهب بالأكثرية، فان الأحكام المحلية لتلك المنطقة - في حدود صلاحيات مجالس الشورى المحلية - تكون وفق ذلك المذهب، هذا مع الحفاظ على حقوق أتباع المذاهب الأخرى) .

- ئیقلیمی -بە خێرایی هەندی کیشەی لاوەکی بۆخۆی دروست کرد وەك داواکردنەوەی بەحرەین لەلایەن هەندی ئایەتولا وناکۆکی لەگەل زۆربەی وولاتان لەیەك کاتدا .

- **سیاسەتی دەرەوەی —هەروەك دروشمەکەیان (لاشرقی ولاغربی)لەیەك کاتدا لەگەل هەردوو سەربازگەی رۆژهەلاتی شیوعی ورۆژئاوای سەرمایەداری ناکۆك بوو لەهەمان کات نەیتوانی وولاتانی بیلایەنیش بەلای خۆیدا راکیشیت.**

- هەر لەسەرەتادا جۆرێك لە ئاڕستەی جیاجیا لە نێوان ئایەتولا گەورەکانی وەك ( تالقانی ومونتەزەری وشریعەتمەداری)لەگەل هیلی گشتی خمینی دەبینرا ..

## (35)

## نوێگەرایی(نوێبوونەوە)　Renewal　التجديد

ئەوانەش دەگریتەوە (دادائی، گەشە، تنمیە، دواکەوتەیی، تحدیپ،تگور،دۆگما، ثالوث هیغلی ...)

بەگشتی (وەك زاراوە)نوی بوونەوە و نویگەرایی دەکریّ بلّیین لەگەل سەرهەلدانی سەرمایەداری ودەولەتی مۆدیرن سەری هەلدا ،لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم نوێبوونەوە ڕەهەندی مۆدیرنەشی وەرگرت ،لەدوای 1970 زاراوەی پۆست مۆدیرنیش سەری هەلداودوای مۆدیرنەی هەرە نویّ، کەلەڕاستیدا هەموی گوزارش لە قۆناغیکی تری نوێبوونەوە دەکات بەشیوەیەکی جیا لە جاران .

لەو سەردەمە مانای نوێبونەوە فراوان کراوە لایەنەکانی گەشەو پەرەپیدان ودۆزینەوە دەگرێتەوە ، ئاستەکانی سروشتی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیش دەگریتەوە بەتاك وکۆوە ،هەندیّ جار ئەو نویبوونەوە بەجەژن گوزارش دەکریّ ، وەك کریسمسی مسیحی وحانۆکای یەهودی[1074] و نەورۆزی کوردوئاریان ،بەلام ڕاستیەکەی مانای نوێبوونەوە زیاتر پرۆسەیەکی ناوەکیە لەلایەنە دواکەوتوە سستەکانی وگۆڕینی بە سیستەمی نویّی چالاك ، گۆڕانی سەرتاسەری نیە ،پاریزگاری کردنیەتی لە ڕەچەلەك وناسنامەو ڕەسەنایەتی خۆی ، بەو پیّیە نویبوونەوە بە ئینگلیزی **(Renewal)** بە

---

[1074] أحد الاعياد اليهودية السنوية أنشأ الاحتفال به يهوذا المكابي سنة 165 ق.م. تذكارًا لتطهير الهيكل به وتجديده. وبعد ثلاث سنوات دنسه اليونانيين بأمر أنطيوخس أبيفانيس سنة 163 ق.م. كما جاء في تاريخ المكابيين الأول 4: 52 – 59. ويسمى هذا العيد أيضًا عيد الأنوار كما ورد في تاريخ يوسيفس (اثار 12: 7) وكان الاحتفال بهذا العيد يشبه الاحتفال بعيد المظال ويدوم ثلاثة أيام ابتداءً من 25 كانون الأول (ديسمبر). ويقع عادة في الشتاء وقد حضره المسيح مرة على الأقل وفيه ألقى خطابًا على الجمهور المعيج (يوحنا 10: 22) وما زال اليهود يحتفلون به للآن.(بروانة :قاموس المسيحی– مادة :تجديد) .

روسیەکەی ((инновация ) بە عربیەکەی (تجدید) لەگەل (گەشە-تطور) و(تحدیث) و مۆدیرنەیی ..جیایە وەك دوای دەردەکەوێ .

وەك زاراوەو بۆنەی سەرهەلدانی زۆر جۆرە بۆچوون هەیە ،بەشێك پێیان وایە بۆنەی سەرهەلدانی دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فرەنسی 1789 ،لەو گۆرانکاریە سیاسیەی کە لە پادشایی گۆڕا بۆ کۆماری و پرۆسەکانی عەلمانی و دیموکراسی و لیبرالّی مافی ئافرەت و هاوولاّتی بوونی هێنا جێی ئنتمای ئاینی و مەزهەبی و توانەوەی لە چوارچێوەیەکی عەلمانی مەدەنی ، واتە پەیوەندی هاولاّتی بە دەولّەت نەك بەدەسەلاّتی ئاینی و کۆمەلاّیەتی و خێلّەکی ، بەشیکی تر سەرکەوتنی دەسەلاتی مەدەنی بەسەر دەسەلاتی ئاینی (قەشەوپاپا) بە نوێبوونەوە دەزانن، بەشێکی تر تەنها بە شارستانی ونەریت وفەرهەنگی تەواوی رۆژئاوای (دوای شۆرشی فەرەنسی1789 ) بە قۆناغی نویێ وسەردەم ومۆدیرن هەژماردەکەن ، بەشیکی تر بەهەمو ئەو وەرچەرخانانەی لە سیستەمی دەسەلاتی پادشاییەوە بۆ کۆماری دیموکراتی دەلّێن (نویگەرای)،کەتیایدا لیبرالی وبازاڕی ئازادو بە دەزگا بوون ودابەشی ماف و ئەرك وهەمولایەك یەکسان بەرامبەر یاسا و یەکسانی پیاو ژن ...ووتراوە نویبوونەوە،لە فقهدا نویبوونەوە ئیجتهاد کردنە ،کە دەرگای ئیجتهاد گالّە بدرێ نوێبونەوەش دەوەستێ وئیتر ئەو زانستە بە مردوو هەژمار دەکرێ ،جارێکی تر لەسەردەمی بێداری زانستی فکرو هزری ئیسلامی سەری هەلدایەوە ،ڕەنگە کتیبی (محمداقبال- تجدیدفکر الدینی)بووبێتە فاکتەرێك بۆ سەرهەلدانەوەی فکری ئیسلامی لە پەنجاکانی سەدەی ڕابووردوو .

هەشە ڕێك بە (مدنیەت)دەلّێن (نویگەرای)واتە : پەیوەندی هاوولاتی داڕنرێ لەهەر کاریگەریەك جگە لە دەولەت دەووترێ نویگەرایی[1075] ،هەر لەو چوارچێوەش زۆر پێناسەی جیا جیای بۆ کراوە بە پێی تێگەیشتن وئاستی زانستی وئینتمای مەدرەسی ، هەندێکی زۆر بە قوولی وهەندێکیشی لەو پەڕی سادەیی.

پیناسەکان :

[1075] الديمقراطية بين العلمانية والاسلام – ص 256 .

+له قاموسه زمانه‌وانیه‌كان :نویبوونه‌وه دژ به كۆنی و مه‌یینه،له عربیه‌كه‌ی (تجديد) :تجدد الشيء فصار جديداً، وهي نقيض البلى أو القديم.

+ ماركسیه‌كان: مانای نه‌فی كردنی كۆن دێت یه‌كه‌م جار له ئابووری ده‌ست پیده‌كات بۆ باقی سه‌رخانه‌كانی تر.

+ (المعجم الحديث للتحليل السياسي) : ئه‌و مه‌عجه‌مه‌ش وه‌ك تیۆری ماركسی ده‌ڕوانیته نویبونه‌وه و پێی وایه له ئابووری ده‌ست پێده‌كات وباقی فاكته‌ره‌كانی به‌دوا دێت ...[1076]

+ **ماریۆن لیڤی ده‌لیٚ** كۆمه‌ڵگه‌ی نویٚ ئه‌وه‌یه كه تاكه‌كانی سه‌رچاوه‌ی نویٚ ی ووزه به‌كارده‌هێنین

+هه‌رچی( هنتكن فیری) پێی وایه نویبوونه‌وه پرۆسه‌یه‌كی پڕ له ئالۆزی وهه‌مه‌لایه‌نیه ، له مادی ونامادی وبه ئامرازی زۆر سه‌رده‌م ،پیشی وایه ده‌بیٚ دیموكراسی ولائیكی بن .

+هنری لۆفافر: انهاء كون الشيء ماكان .

+الموسوعه العربيه: به‌به‌راورد له‌گه‌ل ته‌وه‌ری كۆمه‌لگه‌ی ترو ته‌وه‌ری میژووی خۆی به‌و كۆمه‌لگه‌یه ده‌ووتری نویبوونه‌وه كه داهینان وخۆگۆڕینیكی وا ده‌كا جیاده‌بیته‌وه له‌هه‌ردوو ته‌وه‌ر[1077].

+كتیبی(التجديد فى الفكر الإسلامى) - التجديد: إحياء وبعث ما اندرس منه، وتخليصه من البدع والمحدثات، وتنزيله على واقع الحياة ومستجداتها[1078].

+ موسوعه العلم الاجتماعى : به‌پرۆسه‌یه‌كی پێچه‌وانه‌ی (كه‌لتوری) و (ڕه‌سه‌نایه‌تی, اصاله-orginaliy)پێناسه‌ی نوێگه‌رایی ده‌كه‌ن(1079).

---

1076 -p272 Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts

1077 الموسوعة العربية ج8ص82 .

1078 الكتاب :التجديد في الفكر الإسلامي – دار ابن الجوزي – الدمام–رسالة دكتورا من كلية الإمام الأوزاعي ببيروت

1079موسوعه العلم الاجتماعى ص661

+(موسوعة المعرفة) له پیناسی (التحديث)نزيك دەبێتەوه له نويبوونەوەو دەڵێت : هو(استبدال الأسلوب التقني التقليدي وما يرتبط به من أنماط تتصل بحياة الأشخاص أو الجماعات أو المجتمعات وذلك بأسلوب أكثر حداثة ومعاصرة) .

+د محمد عماره دەلێ (فالتجديد هو السبيل الاستمرارية-اى ثبات الدين الكامل..)[1080] .

+پێناسی فقهی: العمل على اعادة فهم الدين كما كان السلف يفهم وعلى حسن تطبيقه في الواقع وفق اصله نشأته عن تنقيته من المخالفات والبدع السيئة ... بسبب اهواء البشر على مر العصور[1081].

جیاوازی لەگەل هاوتاكانی :

كۆمەلیك چەمك وزاراوەی هاوتای نویبوونەوه هەیه زۆر لیك نزیكن بەلام جیاوازیشیان هەیه،لەوانه (گۆڕان-نەشونما-چاكسازی- پیشكەوتن-گەشەكرد-سەردەمی بوون —شۆڕش، له عربیەكەی: تغيير،تنميه، اصلاح، تقدم، تطور، حداثة، حركه تاريخ، تطور المجتمعات، ثورة،...) ،یەكێ لەو تەقەلایانه (أ.د.سيف الدين عبد الفتّاح )له زانكۆی قاهیره له تویژینەوەیەكی لەبارەی نویبوونەوه دەلیت : له ڕووی لۆژیكیەوه 3 قۆناغی هەیه (بوونی —لادانی —ڕاست كردنەوەی)مانای بوونی هەبوه وسەردەمیك نوێبوه دوای لەكاروان به جیّماوه، ئیستا وەك جاران نویبوویتەوه ، ئەو بۆچوونه گرنگه بەلام لەنگیەكی تیدایه ،زیاتر له ریفۆرم وچاكسازی نزیكه ،چونكه نویبوونەوه ناگەڕیتەوه سەر فۆرمی ڕەسەن بەلكو دەچێته قۆناغیكی تر ،خەریكه بلّێین لیره تیۆره بەناوبانگەكەی هیگل(ثالوث هيغلى) جیبەجێ دەبێت ،هەندێ لای چەسپاوەو دەیەوێ بیپاریزی هەندێ لاشی دەیەوێ بیگۆڕی و دەبیته ناكۆكی ،له ئەنجامدا دەبته شتیكی تر،ئەویش بەدەوری خۆی بەهەمان

---

[1080] د محمد عمارة – معركة المصطلحات بين الاسلام والغرب ص169

[1081] د قطب سانؤ - معجم المصطلحات اصول الفقه – المادة : التجديد

خول تیپەڕ دەبێ و جولانەوەی دیالکتیك وگۆڕان ونویبوونەوەی سەرتاسەری دروست دەکا، ئەو سێ

پێتی برتر

هەنگاوە ناوی نراوە (سێ کوچکەی هیگلی)کە بریتیە لە : (بوون —دژ- پیکهاتەکی بالاتر) یان (الشیئ، ضده، مرکب الأعلی- Theses -untiTheses – synTheses)[1083] ،لەسەر ئەو بنچینە هیچ شتیك لەوەستاوی نیە ، ئەو بۆچوونەی هیگل مانای ڕیك نویبوونەوە ناگریتەوە ،بەلکو مانای گەشەی(تطور) سەرتاسەری دەگریتەوە پیویستە تیۆریکی تری خۆی بۆ بکەینە فلتەر ،کە دەلێت گەشە سەندنی هەرشتیك بریتیە لە نەفی کردنی لایەنی کۆنو سەلبیاتەکەی بە لایەنی نوێ وئیجابیەکەی- ئەوەی ناوناوە گەشە(تەتەور) ، ئەوە گەشەنیە ئەوە نوێبوونەوەیە ، واتە بۆچونەکەی هیگل وەرگیرین ڕاست دەردەچێ ،تەتەورو نویبوونەوەی وەگیراوە .

کەواتە نویبوونەوە لایەنی چەسپاوی هەیە هەموی لەبەردەم گۆڕان کراوە نیە ،لەوەوەش جیاوازە لەگەل خودی گۆڕان ،لەگەل ڕوانگەی مارکسی و سیکوچکە هیگلیەکەش دێت، لەلایەکی تریشەوە لەگەل زاراوەی فقهی (نسخ)یش جیا دەبێت، ئنجا گۆڕینی کۆمەڵیش لەسەر بنچینەی ئامراز نیە، لێرەوە زانستی (ثوابت و متغیرات) خۆی بە گرنگی قووت دەکاتەوە، واتە (نوێگەرایی) مانای گۆڕینی هەموو شتێك نیە.. ، بۆچوونی دروست لە نێوان دوو بۆچوونی پەڕەگر هەیە ،یەکەمیان پێیان دەووترێ (نویگەرایزم) کە دەستکاری (نەگۆڕەکان)یش دەکەن بەگۆڕان ، هەموو نوێیەکیشیان پێ ئیجابیە زیاد لە پێویست ، زۆر وابەستە بە واقیع وعەقلانین ، هەرچی کەلتوریزمەکانن دژی گۆڕانی (نەگۆڕو گۆڕاوەکان)ن ، هەموو کۆنێکیان پێ ئیجابیە ،هێندێ جار بەوانەدەووترێ(جمودي:itra-Conservation) یان(دۆگما)کە (الموسوعة المصطلحات السياسية) وایشێناسکردوة:(موقفسياسيواجتماعي، يدفع بصاحبه الى التشبث بالتقاليد ورفض التجديد والتقدم والإصلاح في السياسة والمجتمعويتحول هذا الموقف أحيانا الى سياسة متكاملة قائمة على كبح وتجميد كل مبادرة تجديدية، وفي المجال الأيديولوجي والنظري، فالجمودية تعبر عن موقف ضمني إزاء بعض المفاهيم والمبادئ الى درجة يصبح معها الإنسان عبدا للفكرة بدل أن تكون الفكرة

---

[365]جون لويز- مدخل الى الفلسفة ص193-194

[1083] سبینوزا —رسالة فی اللاهوت والسیاسة ص100

مسخرة في خدمة الإنسان وسعادته). لەسەر ئەو بنچینەیە هەمو نویگەراییەك معارەزەیەكی دەبیت لەلایەن راهاتوانی كۆن وكلاسیك.. ، زیاد لە پێویست نەقلی ومەبادیئی بەمەرجەع دەزانن ، تەنانەت بەشیك پێیان دەووتری(دادائی)هەمو پیشكەوتن وشارستانی سەردەم ڕەت دەكەنەوەو ،دادائی(كە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەكەم سەری هەلدا)گەڕانەوە بۆ كۆمەلگەی سەرەتایی بە نوێبوونەوەی ڕاستەقینە دەزانی ، هەندێكی تر بە پێچەوانەی (كەلتوری)یان (ڕەسەنایەتی, اصالە- orginaliy)پێناسەی نوێگەرایی دەكەن[1084], بەوشێوە دەگەنە ئەنجامێك كە (كەلتوور)بریتییە لە ڕابردوو و (نوێگەرایش)چی واقع و (حازرە), ئیتر تێروانینەكان كەوتونە نێوان خۆبەستنەوەتەنها بە (كەلتوور) یان تەنها بە (نوێگەرای) ،یان بەشی زۆری هەلوێستێكی مام ناوەندی وەردەگری لە نێوان هەردوو لا ، دەلێت چاكتر وایە نوێگەراییەك لەسەر بنچینەی كەلتوور وەك غاندی ووتەنی دەرگاو پەنجەرە داناخەم بەلام ناشبێ لە ڕەگ وڕیشە دەرمكێشی. ڕای فقهیش وایە كەلە (معجم المصطلحات اصول الفقه ... د. قطب سانؤ) وا هاتوة: (: التجدد .. ثبات الاصل .. وملاءمة فرعه لكل مايستجد ) ، بەلام لەو پێناسە زیاتر دەبێتە پاشكۆ نەك پێشڕەو .

هەلبژاردنی پێناس و چەمكی نوێبوونەوە ئەو ئالۆزیە لێك دەكاتەوە ،كێشەكانی پێكدادانی كەلتوورو نوێگەرایش ڕوونادات ... ،هەندێ جارلە رۆژئاوا نوێ گەری تەواو مانای یاخی بوونە لە ڕەسەنایەتی, ئەسلێ و كەلتورو كلاسیكایەتی و ئایین و تیكەلیش دەكرێ لەگەل (حەداسە)كە بەتەواوی ڕابووردوو ڕەت دەكاتەوە ،.. ئیتر بەو ڕوانگەیە سەرچاوەی سەرهەلدانی لە بەریتانیا بۆ ئیتالیا, فەرەنسا, ئەلمانیا, بەریتانیا, ئەمریكا و پێشەنگەكانیش (ئەلفرد لویزرم), (جۆرج تریل)لەسەدەی (19) دژ بە دەسەلاتی كنیسە وەستان ،بزوتنەوەی نوێگەرای داوای چاكسازی ئاینیان كرد بە جۆریك دەقی ئاینی هێناوە ژێر گەشەی زانست و باری كۆمەلایەتی و گۆڕینی [1085] ، ئەكادیمیەكان زیاتر بەلای ئەوەن حەداسە و گەشەی تكنۆلۆجی پیكبەستیت،وەك

---

[1084] موسوعه العلم الاجتماعی ص661 .

[1085] موسوعه العربیه العالمیه ج9 ص95 .

له(موسوعة المعرفة) بةلاى ئةوةية كة نويبوونةوة ماناى بةكارهيَنانى ئامرازى نويَية لة جياتى ئامرازى كؤن، ليَرەدا جياوازى نيوان تحديث(Modernization) و تجديد(renewal) لەيەكەما گوازتنەوە لەكۆمەلگەی کلاسیکی بۆ تکنۆلۆجی ،هەرچی تجدید ئەوە بە پالپشتی ناوەکی ومێژوو خۆت گەشە پیبدەی بە فۆرمی نوێ وپاریزگاری لە لایەنە چەسپاوەکانی .

رای مەدرەسەکان:

ئەو چەمکە ڕەهەندی فلسفی هەیە ،بەرەی فەلسەفی مادی بەدرێژایی مێژوو هەوڵی داوە بیسەلمێنێ کە ئەو شتومەکە جیاجیایانەی بونەوەر بە ئادەمیزادیشەوە بەرهەمی چالاکی مادە خۆیەتی وەك (لاپلاس وهولباخ وهکسلی شۆبنهاوەروئەنجلس..) دەڵێن هەمو مادەیەك گەشە دەکاو نوێ دەبێتەوەو کۆنەکان لە ناو دەبا بە تەواوی ، شۆبنهاوەر دەلێ سروشت مادەیە،مادەش تەنها ئەو کاتە مانای دەبێ کە گەشە بکاو بەرهەمی هەبێ بۆیە سروشت بە تیکڕایی(بە تاك وکۆوە) لەنوێبوونەوەی بێ ووچانن[1086]، فەیلەسوفە عەقلانیەکانی فرنسا (کوندرسیە،دیدرو،کلود هیلفشیس، جان جاك روسو، وفولتیر..)ووتیان جولەی کۆمەلگە گەشەو نوێگەراییە، بازنەی داخراو نیە ،ئەنجلس بەڕەهایی تر دەلێ:(ئەو گەشەیەی بەهۆی پرۆسەی(نفی النفی) دێتە دی ئەوەگەشەیەکی نوێبوونەوەییە[1087] ، لە فلسفەی هیگل لە ریسایەکی فلسفی موکوم کۆکراوە بە ناوی جولەی دیالکتیکی (بوون —دژ- پیکهاتەکی بالاتر)[365] یان (الشیئ، ضده، مرکب الأعلی-Theses -untiTheses- synTheses)[1089] نوێبوونەوەی پێ دیاری دەکا،هەندێ زانای ئیسلامی سەردەمیش بەو بیرە فلسفیە کاریگەرن د محمد

---

[1086] المثالية الألمانية ص255

[1087] فريدريك انجلس- انتى دوهرينك- ص162-163

[365]جون لويز- مدخل الى الفلسفة- دار الحقيقة بيروت،ترجمة:انور عبداللة،ط2 ص194

[1089]مدخل الى الفلسفة ص193 .

شحرور باس له تیۆریكی قورئانی دەكات هاوشیوەی ئەوەی هیگلی و دەلیّ (..وكل في فلك یسبحون) دەكا ڕێك ئەوەبەرجەستەی ئەو سیكوچكە دیالكتیكیەی هیگلە [1090].

بەو شێوەیە مەدرەسەی لیبرالی وبەهارِۆژئاواییەكان تێڕوانینی تەواو جیایە لەگەل ماركسی وئاینی ، ئەو نوێبوونەوە بە گۆڕینی تەواو دەزانی ،نوێبوونەوە كۆتایی هینان بە كلاسیكیایەتی (دژی تقلیدو تەبەعیەتی ڕابووردوو ، وەك هنری لۆڤاڤر دەلێت(كف عن كونه ماكان)، میژووی كۆمەلگەش بۆچەند قۆناغیك پۆلین كراوە ،هەریەكە لەوەی پیشووتری بەتەواوی جیایە (وەك بەندایەتی -دەرەبەگایەتی — سەرمایەداری )لەوە ماركسیەكانیش بەشداریان دەكەن ،بەلام ماركسیەكان بنچینەی نوێبوونەوە لە ئابووری دەزانی و چینێك بە پیشڕەو دەزانی پیچەوانەی رۆژئاوا ،لەكاتیكا ئیستا رۆژئاوا پێی وایە ئەو پیشكەوتنە لەسەر دەستی برجوازی و بەهۆی داهینانی زانایان هاتۆتە دی ، كەچی ماركسیەت چینی نوێی لە سەرمایەداری پیّ پرۆلیتاریایەو هەم ئەویش دەبیّ پیشڕەو بن ، كەچی مونەزیرانی لیبرالی بۆ نوێبوونەوە دەبیّ لاسایی پیشكەوتوەكان(پیشڕەوەكان) بكەیەوە، لەو سەردەمە (رۆژئاواییە)بناغە فلسفیەكەی (هیلی راستی تەتەور) ، لەودواییەش تیۆرەكەی (والت رۆستۆ) و(سامۆئیل هندگتۆن) داكۆكیان لەوە كردەوە كە نوێبوونەوەو گەشە دەبیت بە دوای پیخوستی وولاتانی پیشكەوتو بیت،لەوەش كۆتایی میژووی لە لیبرالیەت داهێنا ، ماركسیەكانی دوای ڕایان وابوو وولاتانی دواكەوتو بەدوای وولاتانی سەرمایەداری نەكەون (اللاراسمالیە) .

تیڕوانینی ئاینی لە ڕوانگەیەكی فلسفی جیا دێت ، لەكۆنەوە ئەگریكیەكان ومدرسە فلسفیەكانی تر هەستیان بەوە كردوە كە هەموجۆرە جوولەیەك مەرج نیە نوێگەرایی بێت ، نوێبوونەوە لیرە مانای پچڕانی ڕابووردوو ئیستاو داهاتوو نیە ، پچڕان لەگەل كەلتوورو نەریت نیە ، بەڕای ئاینی گەورەترین (مجدد)پیغمبەرەكانن،بەدوای ئەوانیش نوێبوونەوە بەردەوامە ،هەر خودی پەیام ومەبەستی خودا لە دروست كردنی مرۆڤ وكۆمەلگە نوێبوونەوەو داهینان وبەرپاكردنی شارستانیە (اعمار)،پرۆسەیەكی بەردەوامەو ئەركی هەمو مرۆڤیشە ،هەرچەندە لە فەرموودە واهاتوەكە لە 100 سالی جارێك نوێبوونەوە دەكریت (إن الله یبعث لهذە الأمة علی رأس كل مائة سنة من یجدد دینها) ،بەلام وەك

[1090] د محمدشحرور– الكتاب والقران ص247،ص258،ص486 .

لەدوای دەردەکەوی سروشتی گەشەی کۆمەل وانیە (گەشەیەکی مۆنۆتۆنیکە )بۆیە نویبوونەوەی بەردەوامی پیویستە بەتایبەتی لەسەردەمی ئیستا ،ئینجا خودی ئاینیش نویٚ نابێتەوە ..واپێدەچی ئەو فەرمودەیە بە جۆرە راستەقینەکە.ی نەگەیشتبێتە ئێمە .

## هەلسەنگاندن :

نویبوونەوە لە ئیستادا بەردەوامە بیئەوەی قۆناغی هەبیت ..,بە گشتی گەشەو نوێبونەوەو بە یاسای کەلەکە بوونی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی ناگرتە بەر ، ڕاستە هەمو بونەوەر لە جوولە دایە لە گۆڕاندایە بەلام مەرج نیە هەمو جوولەو گۆڕانێك گەشەو چوونە پیش بێت ،مەرج نیە داهێنان ونوێگەرایی بێت ، هەمو سروشت دەجولیٚ و دەگۆڕیٚ بەلام مەرج نیە هەموی نوێبوونەوە وگەشە بێت، جولەی سروشت داخراوو بازنەییە جولەی کۆمەلگەش کراوەیە ،لەوجولە بازنەییە ئاو نابێتە جیوە یان زیو ببێتە زێڕ،.. تۆوی پاقلە نابێتە خورما، هێلکەی مریشکیش نابێتە مانگا، ئەوەی لەگۆڕانی پێشکەوتن و پەرەسەندن دایە لایەنی کۆمەلاَیەتیەکەیە ، کە بەهۆی بوونی ( هۆش ) دەتوانیٚ سلبی و ئیجابی (چاکە و خراپە)ی خۆی لەیەکتر جیابکاتەوە و پەرە دەسێنیٚ و( نویٚ )دادەهێنیٚ ، لە ئەنجامی لیك جیاکردنەوەی بێسود و بەسود، لەوەوە نویبوونەوە سەرهەلدەدا لە سروشت و کۆمەلَگە و ژیاندا، جولَەکان 6 پۆلن: (میکانیکی- جیۆلۆجی- فیزیایی- کیمیایی- بایلۆجی- کۆمەلاَیەتی- فکری)، ئەگەر بەوردی لەو پۆلانەی جولانەوە وردبینەوە، دەبینین سیٚ پۆلی یەکەم تایبەتە بە سروشت ،پۆلی چوارەم زیاتر بە زیندەکی و پۆلی پێنجەم و شەشەم بە ئادەمیزاد، جولەکان لە خوارەو سادەوە بەرەو ئالۆزی وسەروو دەست پێدەکات، بەلاَم مەرج نیە مادام لەسادەوە بەرەو ئالۆزی چوو ئەوە نوێگەرایی وگەشە بێت وەك (سپینسر) بانگەشەی بۆ دەکا ،نوێبوونەوە بڕیاڕی بەشەریە نەك سروشتی ، تایبەتە بەکۆمەلگەو مولکی ئەوە ، ناتوانین ڕەگی بۆ ناو سروشت و بوونەوەر قوول بکەینەوەو ئالۆزی بکەین ،لە ناو کۆمەلگەش دیسان پانتاییەکی تایبەتی هەیە بۆ نویبوونەوە نەك هەمولایەکی کۆمەلگە ،

سنوور هەیە لە نێوان لایەنی گۆڕاو کە پەیوەستە بە (زانستی گۆڕاو)، لەگەڵ لایەنی چەسپاو کەهەر لە ئەسڵدا نەگۆڕن, ...ئەوەی بەووردی لەسەرجەم مەدرەسەو فەیلەسوفەکان تیبینی دەکرێ مەوداو دۆمەینی نوێبوونەوە دیاری نەکراوە ،وا پیشان دراوە هەمو لایەك دەگرێتەوە ،ئەو بەشەشی کە نکولی لەوە کردوە کەهەمو لایەك ناگرێتەوە دیسان نەیتوانیە بە ووردی سنوری نێوان نوێبوونەوەو نوێنەبوونەوە دیاری بکات ،پرسیارەکە لەو بابەتە ئەوەیە لەسروشت چی نوێ دەبێتەوە ؟لە کۆمەلگە چی دەگۆڕێ وچی نوێ دەبێتەوە ؟ لەناو لەشی مرۆڤیش بەهەمان شێوە ؟لەوەوە تیۆری (الثابت والمتغیر)هاتە کایەوە بەلام دیسان ئەو (پابت ومتغیر) وەلام وسنوری ووردی نێوان گۆڕاو نەگۆڕ ، نوێبوونەوەو نوێنەبوونەوە ی پێدیاری نەکراوە ،هەرلە چوارچێوەی هەلسەنگاندن بەهۆی ئەو سەردێرە لایەنی شیاو بۆ نوێبوونەوەو لایەنی نەشیاو (نەگۆر دیاری دەکەین :

**دۆمەینی نوێبوونەوە:** لەهەمو شتێك چ ژیان چ بێژیان ،سروشتی یان ژیاری ..دوولای هەیە ،لایەکیان یاساکانن(امر)لایەکی تریشیان مادەیە (خلق) ،ئیستا لە خواروو بۆمـان دەردەکـەوێ لایـەنی یەکـەم چەسپاوو ونەگۆڕن نوێبوونەوە نایان گرێتەوە ئەوە بەشی دوەمە دەیگرێتەوە ، لایەنی یەکەم پیر نابێ، خۆی نوێ ناکاتەوە چونکە زەمەن لای یاساکان نیە، یاساکان نەمرن، کۆن ونوێی نیە..ئـەوە زانیـاری ئێمەیە پیر دەبێ ودەمرێ ونوی دەبێتەوە لە بارەی یاساکان..، لێرەوە مەدرەسـەو تیـۆرە گـەورەکانی وەك مارکسی چۆن بەهەلە دادەچی کە دەلێت :راستی ئەبەدی نیـە هـەمو شـتێك لـە نوێبوونەوەیـە [1091]، لە شوینیکی تر رۆجی غارودیش بەشداری مارکس دەکاو دەلێن : ئاینەکانیش دەبـن ودەژیـن ودەمرن [1092]، کەچی وانیە ڕاستی ویاساکان نەگۆڕن ناکەوێتە سەر زەمان و مـەکان..(.. وکـل امـر مستقر )[1093]، ئەوەی ڕاست بوو پێش 20 سەدە لە ئێستاش هەر ڕاست بووە، لێرە و لە ئـەمریکا و لەسەر مەریخ (3+4=7)، ڕۆژ گەورەترە لـە زەوی.. ئەوانـە ڕاسـتی نـەگۆڕن، چـەمکی (مەیلـەو ڕاست)، (ڕاستی بەگوێرەیی)، (تۆزێك ڕاست —حقیقە جزئیە) کە لە (مادیە و دیالیکتیك) و هەنـدێ مەردەسەی تر هاتوون چەوتن، لێکیش جیا ناکرێتەوە وەك(میشیل فۆکۆ) دەلێـت راسـتی فەلسـەفی

---

[1091] کارل مارکس- بۆس الفلسفة ص166 .
[1092] مارکسیة قرن عشرین ص156
[1093] القمر- ایة3

وئاینی وزانستی..لیك جیایه، بەلآم(ابن رشد) لە كۆنەوە ووتویەتی راستی ئاینی وفەلسەفی ولایەنەكانی تر دژ بەیەك نین بەڵكو پالپشتن لەسەر بنچینەی یەك ڕاستی شریعەت وفەلسەفەی گەیاندۆتە یەك[1094]، هەر لەسەر ئەو بنچینە(كندی) هەولی داوە فەلسەفەو ئاین بگەیەنیتە یەكتری[1095]، ابن میمون لەبارەی ئاینی یەهودی هەمان ڕاو سازانی بۆ یاسای سروشتی ویاسای ئیلاهی دیاری كردوە لە مەسیحیەتیش(توماس الأكويني) ووتویەتی: (إنّ القوانين الأزلية في علم الله تعالى، ونحن نتعرف عليها تارةً عن طريق الوحي، وأخرى عن طريق العقل) .

ئێمە ئەگەر هاتینە سەر ئەو بۆچوونەی كە ڕاستی و یاساكان نوێدەبنەوە ، ئەوا مانای وایە بۆچوونەكەی (ڕۆجی گارودی-پیش وازهینانی لەماركسیەت) ڕاست دەردەچیٚ و ئاین ودەق وپەیام و یاساكانیش دەبن وپیر دەبن و دەمرن ئەگەر نویٚ نەكرێتەوە ،بەو شێوەیە ئەو زەمینە بۆچوونە تا ئیستا بوویتە پاساوی دەستكاری ئاین ودەق بە ناوی نوێبوونەوەو چاكسازی ،دەڵێن ئەو یاسایانەی پێش 14 سەدە بۆ كۆمەلگەیەك لە زەمان و زەمینی خۆی هاتە كایەوە و كۆمەڵێكی دادگەری پیٚ دروست بوو ئەورۆ ئەو هەلومەرچە گۆڕان و پێویستە ئەو ڕاستی و یاسایانەش بگۆڕێن، وەك ئەتاتورك بەو بەلگانە زال بوو لە مشت ومڕی نێو پەرلەمانی توركیا لە ڕۆژانی 1 و2 و1924/3/3لە نێوان ئەتاتورك وناڕازیەكانی هات، بەوشێوەیە دەبێت ئێمە تەسلیم بەوە بین ئاین وەك یاسا و بەرنامە دەسكردەكانی ئادەمیزاد بێن كە وەلآمی سەردەم و زەمانی زەمینی خۆیەتی، بۆ ئەو سەردەمە دەست نادات، واتا شارستانیەتی ئاینی ڕاستەقینە زیندوو نابێتەوە، هەروەك توبینی دەڵێت (هەموو شارستانیەنێك بە سووڕی منالی و هەڕەتی گەشەیی و مردن تێدەپەڕیٚ)، ئەوەیە ئەسلی هەموو تەقەلاكانی مادی دژ بە ئاین...، ئیبن حزم لەكتێبی(الملل والنحل والأهواء) بەشێكی بە ناوی(الرد على من زعم أن الأنبياء ليسواأنبياء اليوم) تەرخان كردوە زۆر بەتوندی وەلآمی ئەوانەی دایتەوە كە پێیان وایە هەر پێغەمبەریك تەنهابۆ كاتی خۆیان هاتون ، هەروەك ڕاستی نەگۆڕە و ناشمرێت جا چ ڕاستیەكانی سروشت و ئەو بونەوەرە چ ڕاستی و یاساكان، ..ئەوەی وەلامی هەمو ئەوانەیە ئەوەیە هەمو لایەنێك نوێنابێتەوە ،ئەولایەنەی مادیە ،دەبیٚ وەبەر نوێبوونەوە بكەوێت ،ئەوەی (یاسایە-

[1094] ابن رشد - فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعةمن الإتصال ص58-

[1095] ابو النصر الفارابى الثمرة المرضية فى بعض الرسالات الفارابية- تحقيق:د عادل نبيل ص83

راستیە –كلمة الطیبة..) نوێنابێتەوە ، ئـەوەش دۆمـەینی نوێبوونەوەیـە ،لەهـەمان كـات سـنوری ڕاستەقینەی (ثابت ومتغیر).

کەواتە مەرج نیە هەموو نوێیەك ئیجابی بێت وهەمو كۆنێكیش خراپ و بێكەلك بێت ،تەنانەت هەندێ دیاردە هەیە هەر كۆن نابێ ،هەرچی ڕاستی بێت نەكۆن دەبێ نە پیر دەبێ نەدەشمرێ،فراوانتر لەوە نیوەی (بوون) چەسپاوە كەلایەنی نامادی پێ دەووترێ ، یان وەك لەسەروو باسمان كرد بە زاراوەی ئاینی (امر)ی پێ دەووتریت وبریتیە لە (ڕاستیەكان- یاساكانی سروشت- روح –پەیام -) ،بۆیە ئەو سنورە ڕەهایە لە نێوان كۆن ونوێ ،كەلتور ومۆدیرن نیە ،دەكرێ سود لە ئەزمونی نوێبوونەوەی رۆژئاوا وەرگیرێ بەلام ناكرێ لاسایی بكریتەوە وەك (تەبەعی)، چوتكە نوێبوونەوەی رۆژئاوا زۆر جیایە لەگەل ئەو هەلسەنگاندمان ،سەرچاوەی ئێستای نوێگەرای هەروەك زاراوەكانی تر لە رۆژئاوا سەری هەلداوە، لەبارودۆخێكی كۆمەلایەتی و ئابووری فكری و باری ئایینی زۆر جیایە لەگەلّ جیهان بەگشتی, جا دیسا لە (تعمیم)كردنی و وەرگێرانی و هێنانی بە فۆتۆكۆپی بۆ جیهانی تر قەیرانەكە دروست دەكا, لە رۆژئاوا نوێ گەری تەواو مانای یاخی بوونە لە ڕەسەنایەتی, ئەسلّ و كەلتورو كلاسیكایەتی و ئایین و ...وەك لە نوێبوونەوەی ئەوروپا ڕوویدا ، ئینجا سنوریكی ڕوون نیە لە نێوان (لایەنی نوێبوونەوە ولایەنی پاریزگاری لێكراو) ، ئەوانەی زۆر لایەنگیری نوێگەرایین وئەوانەی زۆر لایەنگیری ڕەسەنایەتین ، هەردوولا كەمێك بە هەلە داچووینە.

لەبارەی زاراوەكەش ( بە نوێگەراییشەوە)بە پێ ی ڕووداوێكی مێژووی ناوەكە وەردەرگرێ، ئەگینا وەك ناوەڕۆك هەر هەبووە، لایەنە سەلبیەكەی ئەو زاراوەش هەر هەمان فكری كۆنی نائایینیە، كەزۆربەیان كۆدەنگن لەو بارەیەوە ، هەتا فكری ماركسیس، بەپێی ئەو فكرانە دۆزینەوەو داهێنانی زانستی و پێشكەوتنی پیشەسازی پەیوەندیەكانی كۆمەلّ دەگۆڕێ ونوێبوونەوە بەرپا دەكا، وەك (ئەنجلس ) دەلّێ: (پیویستیەكان دایكی نوێبوونەوەن) ئەوە ڕای ئەكادیمی سەردەمیشە ، ماركس دەلّێ ئەو كۆمەلّگایەی (ئاشی - با) دروستی دەكا دەرەبەگیەو ئەو كۆمەلّگایەی (ئاشی -هەلّم) دروستی دەكا برجوازیە، بۆیە بەرامبەر گەشەكردن و نوێبوونەوەبواری یاخی بوون نیە ،هەموو دەبێ ملكەچی بن, هەلّبەتە وا دەبینین ئەو گۆڕانكاری و شۆڕشە تەكنیكیانەی گوازستنەوەو عەولەمەو ئاسمانی و

کارەباو.. چەندە سسیتسەمی کۆمەڵگە و پەیوەندییەکانیانی گۆڕیوە بە تاك و کۆمەڵەوە، کاریگەری گەلێ زۆرە، کەواتە دەتوانین بڵێین مرۆڤ ونوێبوونەوە پێکەوە هاتون ، بەلام لەهەمو ئەوانە لەگەل بۆچوونەکانی سەرووی مارکسی ولیبرالی جیا دەبینەوە لەبارەی قەبارەی نوێبوونەوە ،لەلایەکی تر ماکینەی نوێبوونەوە ، ئەوەی مارکس دەلێ کەس ناتوانی لەبەردەم نوێبوونەوە یاخی بێت ئەوا رۆلەکە دەداتە فاکتەرەکانی دەرەوەی مرۆڤ ،بەتایبەتی پیویستیە ئابووریەکان کە ئەنجلسیش مەبەستی لەوەیە ،لەکاتیکا ئەوە مرۆڤە بەو کارە هەلدەستێ ،ئاینیش هەروا دەلێ کە دەلێ(انی جاعل فی الارض خلیفة) ،لەو ڕووەوە ڕەنگە بۆچونی هیگل وورد تر بیت کە دەلێ نوێی ئیجابی نەفی کۆنی سەلبی دەکا ، نەیدەووت نوێ نەفی هەموو کۆنێك دەکا وەك لە مارکسیەت و فەلسەفەی رۆژئاواش (الجدید ینفی القدیم) پیادە دەکرێ، هەموو نەفی دەبێت هیچ رەسەنایەتی چەسپاوێك نامێنێ لەو پرۆسەیە.. ، لە ئاین بەگشتی وئاینی ئیسلام (ثوابت) هەیە دەبێ بمێنێ ، پێوەرەکان، ئەخلاق و دادگەری، یاسا لە شریعەت و بەهاو، ئەوانە ڕاگری کۆمەلن ئەگینا کۆمەل نابێت، نە هەموو نوێیەك ئیجابیە نە هەموو کۆنێکیش سەلبیە.

**دۆمەینی نوێبوونەوە لەکۆمەلگە :** جاروایە هەرناوە ودەووترێ یاسا،وەك یاسا وەزعیەکان ،ئەو جۆرە هەر ناوە ڕەنگە نەگاتە ئاستی (ڕێسا)ش ،ئەو جۆرە یاسایانە چەسپاو نابن ،هەردەم پیویستیان بە گۆڕان ونوێبوونەوە هەیە ، یاساکۆمەلایەتیەکان ڕاستەقینە نەگۆڕە حوکم لەسەر گۆڕان و پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کاریگەریەکانی دەکا، حوکم لەسەر نوێبوونەوە دەکا ، ئەو یاسایانەش ئەگەر بە دروستی دۆزرابنەوە ئەوا نەگۆڕە هەر لەسەرەتای بەشەریەوە تا کۆتایی، ئەو حاڵەتە بەند نیە بە (قۆناغ و گەشەی کۆمەل، بە زەمان و زەمین، بەباری تەکنەلۆجیا).. ئەو یاسایەی لە ( داس و ئاشی با) ڕاست ودروست بووە لە دەڕاسەو ئاشی هەڵمی و لە ئینتەرنێتیش یاسای دروستن، هەر هەمانیشن کە دادگەری لە هەمو سەردەمێك دروست دەکەن کە لە ئاینی ئیسلام پێ ی دەووترێ (شەریعەت)، دادگەری و یاساو تەرازووی سەردەمی (ئاشی-با) هەمان ماهیەتە لە گەل سەردەمی (ئاشی- هەڵم) و هەمانیشە لە سەردەمی (ئینتەرنێت)، مەگەر ئەو یاساو ئەخلاق و تەرازوو و دادگەریانە چەوت بێت, ئا لێرەدا نوێگەرایی دەوری ئیجابی دەبینێ لەو بەشەش واتە چۆن دەوری ئیجابی بووە لە بەشەکانی زانستەکانی کۆمەڵایەتی و فکری و سیاسی و ئابووری و,, ئاواش

ئیجابی دەبیّ لە سیستەم و ریّباز و ئاین و پەیوەندی و.. کاتیّ ئەوانە ستاندەر نەبیّت، لەجیّی خۆی نەبیّ.. دەسکاری کرابیّ، ئەفسانەیی و و هەلّگیردرابیّتەوە و لادەر بیّت.. رۆلّیّکی گرنگ دەبینی بۆ راست کردنەوەو جیّگیرکردنی واتە لە گۆراوی و ناجیّگیری و ناراستی دەیخاتە سەر جیّگیری و ئارامی و وەستان.. ئەوە جەوهەری نوێبوونەوەیە .

لیّرەوە دەریشدەکەویّ ئەو سیّ رایەی سەروو ورد نین ،نە نویّ گەرایی بەتەنها و نە کەلتوریش بە تەنها نە بە هەردوکیشیانەوە راستیەکی موتلەق پیّك دەهیّنن ،ئایینی ناچالاك وکەلتورتیکەلن تارادەی یەکسانی ،بەلام ئاینی ئەکتیڤ (وەك ئاینی ئیسلام) و کەلتور لیّك جیانە، مەگەر ئەو کەلتورانەی سەد دەرسەد لە ئایینی ئیسلام پیّك هاتبیّ ،کە زۆر زەحمەتە ،هەرچەندە میلەتانی عرب جار وایە ئەو پاگندەیە دەکەن ،بەلام کەلتوری عرب و ناوەرۆکی ئاین لیّك جیان ، ئەو کەلتورەی ئەوانە مەبەستیانە بریتیە لە ئاویّتەیەك لە نەریتە کۆمەلاّیەتی و خیّلّەکی و بەشیّکی ئاینی و دەروونی تایبەتی و لەگەلّ شارستانی سەردەمیان، ئەوە تیّروانینی عەلمانیە بۆ کەلتور کە دەیەویّ کەلتور بکاتە پاسەوانی زیندانیەکەی ،راستە ئەو کاتە کەلتورو ئاین پیّکەوە پیرۆزییەکی نیە تا دەستکاری نەکریّ.. ،ئەو کاتە ئاینیش توشی دوگما دەبیّت وپیّش لە نویّبوونەوە دەگریّت ، لیّرەدا ڤۆکۆیاماو نووسەر و رەوشەنبیرانی عەلمانی جیهان و کوردستان لیّی بە هەلّەدا چووینە وا دەزانن ئیسلام دژی نویّگەراییە .

لەبارەی ئەو رایەی کەدەلیّ دەبیّ نویّبوونەوە لەسەر ئەزمونی رۆژئاوابیت ،چونکە زەمینەکە(دیموکراسی وعەلمانی ولیبرالی وبازاری ئازاد) بەتەواوی یەکترتەواو دەکەن ،ئاوانیە.. نویّگەرایی و تنمیەو گەشەی تکنۆلۆجی ئەو پەیوەندییە ئۆرگانیکەیان پیّکەوە نیە ، ئەو بابەتە زیاتر لە بابەتی (قەیرانی گەورەی سەرمایەداری) چارەسەر کراوە لەو مەوسوعەیە .

<u>نوێبوونەوە لە ئاین (تجدید)</u>

عەلمانیەکان بەگشتی و بەشیّکی بچووکیش لە (مەدرەسەی قصدی- ئیسلام) بە هەلەیی باسی نوێبوونەوەی ئاین دەکەن ، پیّناسی (تجدید) ولە فەرهەنگە فقهیەکان وا هاتوە: تحدیث, اعادة البناء اما تجدید الدین, العمل علی اعادة فهم الدین کما کان السلف یفهم وعلی حسن تطبیقه في الواقع

وفق اصله نشأته عن تنقيته من المخالفات والبدع السيئة ... بسبب اهواء البشر على مر العصور[1097]، پێناسەکەی جوانە ئەگەر لە جیاتی (دین) (فهم الدین)دانابوایە ،هەرلەوهەلەیەوە

(شبلی عیسمی) لێی نەقل کردوون: ((...تجدید الدین وفهمه بما یتلاءم مع روح العصر ومنطق العلم والتطور))[1097]، لە بنەچەدا ئەو فەرمودەی سەروو کەدەڵێ لەسەری هەر 100 ساڵێك نوێبوونەوە لە ئاینی ئومەت ڕوودەدا ، ئێمە هەر لە فەرمودەو قورئان فێر بووین کە ئاین نوێ ناکرێتەوە بەڵکو تێگەیشتنمان لە ئاین نوێ دەبێتەوە ، فقه نوێ دەکرێتەوە ، ئەوەی دەڵێ ئاین نوێ دەکرێتەوە باش لە ئاین نەگەیشتوە ئەوە هەمان گۆتەیە کە لەلایەن زۆربەی وەزارەتەکانی ئەوقافی عەرەبی و ئیسلامی بە چاوساغی هەندێ مەلای (ئایەت فرۆش) دەگۆترێتەوە، لە کوردستانیش بەنەزانی جارجار دەیڵێنەوە، نەخێر، دەکرێ بۆهەندێ ئاینی وا کە خاوەنی دەقی چەسپاو نەبێت ، یان بۆ ڕارەوی تر دەبێت ، بۆ ئاینی ئیسلام نابێت،(ئەلفرد لویزرم) و(جۆرج تریل)لەسەدەی (19) دژ بە دەسەلاتی کنیسە وەستان ،بزوتنەوەی نوێگەرای داوای چاکسازی ئاینیان کرد بە جۆریك دەقی ئاینی هێناوە ژێر گەشەی زانست و باری کۆمەلایەتی و گۆڕینی[1098] ، بەشێکی ئاینی لەبەرامبەر ئەو بۆچونە بەتەواوی دژی نویبوونەوە دەوەستێ و ناتوانێ سنوری گۆڕاو ونەگۆڕ لەو بابەتە بەووردی لێکجیا بکاتەوە ،دەڵێ ئاین تەواوبوە نوێکردنەوە هەڵناگرێ ..، ئەوە ڕاستە بەلام هەمو ڕاستیەکان نیە ،ئاین هەمیشە تەواوە بەلام هەمیشە پیویستی بەنویبوونەوەی تیگەیشتن لە ئاین دەویت..،مانای گۆڕینی ئاین نین، گونجانی ئاینیش نیە لەگەڵ واقعی خەڵك، بەڵکو نوێکردنەوەو گێڕانەوەی خەڵکەکەیە بۆ سەر ئاین، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە هەمیشەییە بێتەدی ((ولقد بعثنا في كل أمة رسولاً أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت..))، کەواتە(نوێکردنەوە)دوو پرۆسەمانا لەباوەش دەگرێ: 1- نوێکردنەوەی فکری ئیسلامی (نەك ئیسلام خۆی) و پێشخستنی تا پێشڕەوایەتی بزوتنەوەی عەقڵ وەرگرێتەوە. 2- گێڕانەوەی خەڵکی بەرەو ئەو فکرە و پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامە لەژیاندا.

---

[1096] د قطب سانؤ - معجم المصطلحات اصول الفقه – المادة : التجديد

[1097] العلمانيه والدوله الدينيه ص74

[1098] موسوعه العربيه العالميه ج9 ص95

جا ئەو نوێکردنەوەیە لە هەر سەرەدەمێك بە ئامرازی جیاجیا خۆی دەنوێنێت بەپێی بارودۆخی سەردەم، لە سەردەمی خەلافە و سولّتانەکان - لەگەڵ نوقستانیش - (تجدید) بریتی بوو لە چاککردنی تاك بە هۆی (امر بالمعروف والنهی عن المنکر)، لەو سەردەمەدا (نهی عن المنکر) بێ هێزی (تەنفیزی) و بێ دەسەڵات و حکومەت ناکرێت، کە دەروازەی گۆڕانە، سەردەمی ئێستاش گۆڕینی دەسەڵات بەهۆی بزوتنەوەی سیاسیيە، بۆیە ئەو (تجدید)ە لەژێردەسەڵاتی عەلمانی مانای ئەو رابوونە دەدا، مانای بزووتنەوەی ئیسلامی دەبەخشێ بەپێی باری سەردەم، هەروەك چۆن ئیدارە و جۆری دەعوەی مەکە لەگەڵ مەدینە جیابوو، لە پێغەمبەر (د خ) بۆ حەزرەتی عومەر جیابوون لەوێش بۆ سەردەمەکانی تر جیابووە، هەر سەردەمەو ئامرازێکی نوێ بەکارهاتووە لەگەڵ گەشەسەندن و فراوان بوونی حوکمی ئیسلامی سوود لە ئەزموونی بەشەری وەرگیراوە.. بۆیە دەعوەی پەیامی لە سەرەتاوە لە سەردەمی جادوو بە دژە جادوو کراوە، بەلاغە بە دژە بەلاغە، فکر بە دژە فکر.. ئێستاش سیاسەت بە سیاسەت.. لەگەڵ جیاوازیەك (دژەجادوو، بەلاغە، فکر، ... سیاسەت)ی ئیسلامی جیایە لە جەوهەردا لەگەڵ بەرامبەرەکانی.

ئەو میکانیزمە مێژووییەی ئیسلام هۆکارێکی بەهێزی بەرپابوونی (ڕابوون) و دروستبوونی بزووتنەوە ئیسلامیەکانە، هەمان ئەرکی (تجدید) و درێژکراوەی (خط الأنبیاء)ە، گیروگرفتەکان و پرسیارەکانیش هەمانن کە ڕووبەڕوویان بویتەوە.

ئەو تێڕوانینە دروستە پرسێك دروست دەکات دەبێ هەلوەستەی لەسەر بکەین کە ڕووبەڕووی ئاین دەبێتەوە ، ئەویش ئەوەیە گوایە ئاین چەسپاوەو پێویستی مرۆڤیش لە گۆڕانە ، یەکەمیان نوێ نابێتەوەو دوەمیان هەردەم لە نوێبوونەوەدایە ،کەواتە شریعەت وگەلالەکانی پیغمبەران تەنها بۆ سەردەمی خۆیان گونجاوە ،ئەوەیان هیشتا قوول ترە ، لایەکمان لەو پرسە لەسەروو ڕوون کردەوە ،پیشان درا ئەگەر هاتینە سەر ئەو بۆچوونەی کە ڕاستی دەگۆڕێ ، واتا یاساکانیش دەگۆڕێن (کە بەشێکن لە ڕاستی)، ئەوا شەریعەتیش دەگۆڕێ ، واتا ئەو یاسایانەی پێش 14 سەدە بۆ کۆمەڵێك لە زەمان و زەمین هاتە کایەوە و کۆمەڵێکی دادگەری پێ دروست بوو ئەوڕۆ ئەو هەلومەرجە گۆڕان و پێویستە ئەو ڕاستی و یاسایانەش بگۆڕێن بۆیە هەندێك لە رەوشەنبیرانی جیهانی موسوڵمانشینیش لەسەر ئەو بنچینە داوای دەستکاری (شەریعەتیان) کردووە تا بگونجێ لەگەڵ پێشهاتەکانی سەردەم

یان هەر بەیەکجاری ئیلغا بکرێتەوە لەنەوەی یەکەمی عەلمانیەتەوە لەسەردەمی (کمال ئەتاتورك) و (ئەلب کۆك) و هەتا تەهاحسین، حبیب بۆرقیبە، تەسلیمە نەسرین، .. ئەوکاتە مانای وایە دەقی ئاینی وەك یاسا و بەرنامە دەسکردەکانی ئادەمیزادە تەنهاوەڵامی سەردەم و زەمانو زەمینی خۆیەتی، بۆ ئەو سەردەمە دەست نادات ، واتا شارستانیەتی ئیسلامیش زیندوو نابێتەوە، هەروەك توبینی دەڵێت ( هەموو شارستانیەنێك بە سووڕی منالی و هەرەتی گەشەیی و مردن تێدەپەڕێ)،ئەوەی زۆر یارمەتی ئەو بۆچوونەدەدا پەیوەستی فەقیهو ئەهلی ئاینە بە ڕابووردوو و سەلەف و سەردەمیك ،کەمتر بۆ ئیستاو داهاتوو قسەیان هەیە ،لەلایەکی تریش بوونی (اسباب نزول)بۆ قورئان ودەقەکانی ئاین زیاتر وادەکا کە ئاین بۆ ڕابووردوەو توانای نوێبوونەوەی نیە ، لەوەوە سەرچاوەی هەموو تەقەلاکانی مادی دژ بە ئاین دەست پێدەکا ، سپینوزا و روجی غارودی وئەنجلس ولینین پێیان وایە کتێبی پیغمبەرەکان بریتین لە زانیاری وپیداویستی سەردەمی خۆیان، رەنگە بۆ ئەو سەردەم ئیجابی بووبن،شۆرشگێر بووبن ، وەك ئەنجلس ورۆجیەغارودی نمونەی دروشمی شۆرشی تۆماس منزیر دەهینەوە[1099]، سپینوزا زۆربەی گومانی لەوە دروست بوە دەلێ کتیبی پیغمبەرەکان بریتین لە وەلامی کیشەو زانیاریەکانی سەردەمی خۆیان ئەوەش نیشانەیەکی بەشەریە نەك خوایی[1100] هێگلیش هەروا دەلێ بوونی ئاینی جیاجیا گوزارشە لە گەشەی بیری ئادەمیزاد[1101] ، بەکورتی دەیانەوێ بلێن ئەگەر ئەو ئاینانەش بۆ سەردەمی خۆی توخمی ئیجابی تیدا بێت ئەوە بۆ ئەو سەردەمەی ئیستا ناشێ، توانای نیبوونەوەشی نیە ، ئەو تەنزیرەی بەسەرچوونی ئاین گەورەترین زەخیرەی مانەوەی سیستەمی عەلمانیەتە بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامیدا، لەو ڕووەوە بەشیك لە بیریارانی ئیسلامی(زیاتر ڕیفۆرمخواز یان مودیرینخوازانیان پیێ دەوترێ- عبدالکریم سروش، نصر حامد ابو زید،محمد ارکون،حیدرحیدر،محمد عابد الجابری..)بە جۆریك لە جۆرەکان ئەو بۆچونەیان هەیە، خەریکە وەك (موسا بن مەیمون)بلێت پیغمبەرایەتی زروفی زاتی ومەوزوعیە عەقلیکی بالاو زەمینەیەکی لەبار پیغمبەر بەرهەم دێت نەك هەر بە پەیام ،گەورە بیریاری ئیسلامی عبدالکریم

---

[1099]مارکسیە القرن العشرین ص147 وص150 ئەنجلس لە کتیبی (ثورة الفلاحین) باسی هەمان شۆرشی کردوە .

[1100]رسالە فی اللاهوت والسیاسە ص145 وص168

[1101] مارکسیة القرن العشرین ص153

سروش زۆر بە سەرسامیەوە ئەو ڕایەی (فەزل الرحمن) دەگوازیتەوە کە دەڵیٚ: پەیامی پیغمبەر بە ئاشکرا بارودۆخ وئاستی زانیاری ئەو کاتی بەسەرەوە دیارە[1102]،دەڵێن ئایەتەکانیش پڕە لە ڕووداوو ناوی ئەو سەردەم ..، ئەوە ئەگەر وابێت نویکردنەوەی ئەستەمە.

لە سەر ئەو بنچینەیە ڤۆکۆ یاما بە دوای ئەویش زۆرێك لە علمانیەتی دەڤەری وجیهانی دەڵێن ئیسلام کێشەی لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری نادادگەری نیە ،بەڵکو لەگەڵ (نوێگەراییە)، ئاینە ناگونجیٚ لەگەل پیشکەوتن وداهینان وکۆمەلگەی لۆگۆسی عەقلانی ،هەندێکی تر دەڵێن ئاین پێویستی بە کۆمەلگەیەکی وایە لەنگی لە عەقلی هەبێت،بۆ کۆمەلگەیەکی کۆنخواز دەگونجیٚ ، ئینجا ئاین دەتوانی جێی خۆی بکاتەوە ، مەرگی ئاین لەگەل پێشکەوتنی عەقل ونویگەرایی و پیشوەچوونە، رزۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەلیت:سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقلمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فلسفەی مادی نابن کە تاکە چارەنوسیانە لەگەل گەشەو نویبوونەوە دەگونجیٚ[1103] ،ئەوەی زیاتر بە دیویکی تر دەسەلمێنیتەوە بریتیە لە عەقلی دوگما و سستی گەشەو نەبوونی ئیرادەی نوێبوونەوە ،بوویتە هۆی ئەوەی کۆمەلگەی ئاینی لەهەمو کۆمەلگەکانی جیهان دوا کەوتووتربێت .

کێشەی هەموو ئەو بیریار و نووسەرانەی کە ڕەخنەیان لە ئیسلام هەیە لەو بارەیەوەو بانگێشەی ئەوە دەکەن کە ئاین ڕێگری نوێگەراییە ،بەو شێوەیە رۆژئاواو مارکسیەت وعەلمانی دەیانەویٚ دووڕیانەك لە پیش ئاین بکەنە بۆسە ،یان گۆڕینی هەمو ئاین بە پێی واقعی سەردەم یان دوگمایی و بە جێمانی ئاینی ، لەبەرامبەریشدا زۆربەی ئەهلی ئاین بەرگریان لەو هێرشە کردوە هەولی مانەوەی هەمویان داوە نەگۆڕێت نوێبونەوە نەبێت، لەبەرامبەریدا (ئوسولی)و (رادیکاڵی)یان (سەلەفی)لیٚ پەیدا دەبێت واتوشی کاردانەوە دەبن دژی خودی نوێگەری ونوێبوونەوەش دەبنەوە ، لەکاتێکا ئەسلی ئاین نەئەوەیە نەئەمە، لایەنی شایەنی گۆڕان هەیەو چەسپاویش هەیە ،نەك ئەو (ثابت والمتغیر)ەی باوە لە نێو بیریارانی ئاینی بە جۆریکی ترە ، ئەوانەی دەگۆڕێن بوارو بەرهەمی زاستەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاٌیەتی یە نەك ڕێبازەکانی کە بریتین لە یاساو سیستەم و دادگەری و ڕەوشت و

---

[1102] عبدالکریم سروش-ئاین لەسەردەمی مودیرنێتەدا ل192 .

[1103] المثالیة والمادیة وازمة العصر ص95

پەیوەندی سنوور و حەرام  و حەلال و تەرازوو و ڕاستیەکانی بەگشتی، ئەوانە بەهیچ جۆرێك (نویێ) ناکرێنەوە.. هەرچی دەستکارییەك دەبێتە کارەساتی کۆمەڵایەتی، ڕیشەیان دەچێتەوە سەر دنیای زیندەگی وفسیۆلۆجی وتا دەگاتە یاساکانی سروشتی ، ئەوانە بەند نین بە سەردەم و زەمان و زەمین و ئاستی گەشەی کۆمەڵ و تەکنینك و.. کۆن نابن تا نویێ بکرێنەوە.

لە لایەکی تریش هەندێ نوێگەرای ئاینیش وا دەڕواننە ئاین وئیسلام (تجدید) کە ئیسلام نوێ دەکەنەوەبە چەن ئاڕستەیەك ، ئەو کاتە پێی دەووترێ نوێبوونەوەی ئاینی،ڕاستیەکەی وانیە دەقی ئاینی وپەیام نوێناکریتەوە ،خۆی کۆن نابی تا نوێی کەیەوە ،بەلکو نوێکردنەوە لە تێگەیشتنی بەشەریە بۆ ئاین  ،بەشیکی تر بە ناوی نوێبوونەوەو کرانەوەو تەواوی مەبەستی ئاینی  دەعەقلێنی بۆ ئەو زەمان وزەمینە تەسکە، تا ئەو رادەیە بەشێکیان لە کۆتاییدا وەك (سپینۆزا) دەگەنە ئەنجام کە بلێین (إن الوحي الذي أرسله الله كان يتغير وفقاً لفهم الدنيا وآرائهم).[1104] ، هەریەکە لە بزوتنەوەی (زەنج) و (قەرامتە) کە داوای (تجديد) و نوێکردنەوەیان دەکرد گەیشتە (3) خاڵ کە ئێستاش کێشەیە: (1) العقل قبل النص، (2) الحقيقه قبل الشريعه، (3) الإبداع قبل الاتباع.

**نوێبوونەوە لە ئاین ولە ئایدیۆلۆجیادا:** جیاوازی ئاینەکان لەگەل ئایدیۆلۆجیە گەورەکانی بەشەری ئەوەیە یەکەم لایەنی نەگۆڕی هەیە قابیلی نویبونەوە لە(سێوەو ناوەڕۆك)نیە ،لە ئایدیۆلۆجیەکان ئەو بوارە دۆمەینی نیە ،هەموی دەگرێتەوە مەگەر دەمارگیری یان پالپشت کرابیتە پەیام و(كلمة الطيبة)ی لیێ دەرچووبێت،  لە ئاین نوێبوونەوە لە خودی ئاین نیە لە تیگەیشتنی ئاینە ،نوێکردنەوەی  ئیسلام نیە  نوێکردنەوە  بە ئیسلامە ،واتە لە فقهە نەك لە دەق ،بەهەمان شێوە نوێبوونەوە لە  مسیحیەتیش گەڕانەوەیە بۆ تیگەیشتنی بەشەری نەك خودی دەق،هەرچەندە جۆری جودای هەیە ،بەشێکیان گەڕانەوەیە بۆسەر بەهاکانی خودی مسیحە ،ئەوانەش وەك بەشیك لە ئاینی ئیسلامی سەلەفی مەسیحین ،بەلام بەشیکی تر نوێبوونەوە بە چاکسازی ونویبوونەوەیەك بۆ کنیسەی ڕەسەن و ڕەچاوی باری مرۆڤی نویێ بکات ،بەشیکی تر هەر نوێبوونەوە بەتەواوی ڕەتدەکەنەوەو ڕابووردوو تەقدیس دەکەن ، لەوبارەیەوە (مەتران جۆرج خیزردەلیێ ووشەی (نویبوونەوە) لە ئینجیل

---

[1104] سپینۆزا (رساله لاهوت والسياسه) ص168. ئەوە بە ڕوانگەی ئەو ئینجیل و تەوراتەی محرف کراوە وادەڵێ.. نابێ تەیبی هەموو وەحی بکرێ.. نوێ گەرانی ئیسلامی بە هەڵەدا دەچن بەو شێوەیە.

نەهاتوە ،بەلام دوای وورد بوونەوە بە جۆریك هاتوە (الحقَّ أقول لكم إنكم أنتم الذين تبعتموني في التجديد متى جلس ابن الإنسان على كرسي مجده - مت 19: 28) ،بەشیکی تر لە موفەسیرانیان دەلێن مانای نوییبوونەوەی کنیسەو دام ودەزگای ئاینی نیە ،بەلکو جیهان بەتیکرا خۆی نوێدەبیتەوە لەلایەن خوای گەورەوە وەك لەو ئایەتەیان دەردەکەوێ : وأعطيكم قلبًا جديدًا. وأجعل روحًا جديدة في داخلكم. وأنزع قلب الحجر من لحمكم، وأعطيكم قلب لحم وأجعل روحي في داخلكم وأجعلكم تسلكون في فرائضي، وتحفظون أحكامي وتعلمون بها.. وتكون لي شعبًا، وأنا أكون لكم إلهًا وأخلصكم من كل نجاستكم.. (حزقيال 36: 25-29)، لەوەوە چەند نوسخەی ئینجیلی جیاجیا دروست بوە ،بوویتە هۆی نەمانی مەرجەع ، ئەو دەردە لە ئیسلام گەیشتۆتە فقه و فەرمودە بەلام نەگەیشتە قورئان ،بۆیە لە ئیسلام مەرجەعی ماوە،بۆیەش مەودای نوێبوونەوەی ڕوون ترە ، بەلام تا ئیستا وەك پێویست نەتوانراوە (فلسفەی نوێبوونەوە)لەسەردەمی دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی بکرێتە میکانیزمی پیشکەوتن ، جار وایە بوێری ناکرێت وچاوەڕێی سەد سالیەکەو سەری سەدە دەکەن وبۆ نوێبوونەوە، یان تەقدیسی رابووردوو کە لە فەرمودەی (خیر القرون...) هاتوە ، ئەوە عەقل ونوێبونەوە دەوەستێنێ، لەکاتێکا خودی ئیجتهاد نوێبوونەوەیە ،ناشکرێ هەمو کەس بەو ئەرکە هەستێ بەبیسەروبەری(فەوزا) ، دام ودەزگاو نەخشەو پلانی دەوێ ، لە تویژینەوەیەك هەندێ لەو مەرجانە لەو سەردەمەدیاری کراوە کە بریتین لە(پاکی بڕواو پڕۆگرامیکی دروست- زاناو موجتەهید بێت- نوێبوونەوەکەی هەردوو مەیدانی فکری وکۆمەلایەتی بگریتەوە —نوییبونەوەکەی هەمولایەك بگریتەوە ) ،ئەوە زۆر لاوازە لە چاو نوییبوونەوە بۆ بەرپای شارستانی کە ئەسلی مەبەستی ئاین وخودی مرۆڤیشە ،ئینجا نوییبونەوە لەسەر دەستی یەك کەس نابیت ، هەمو لایەکیش کۆك نین چاوەڕێی 100 سال پیویست بێت، ئیبن کەسیر پێیوایە(مجدد)ئەوانەن کە زانستی شەرعی هەلگرتوە ، نوێبوونەوە بەو مواسفاتەی (مقاصدی ئاینی) لەسەر هەمو کەس پیویستە بەلام لەکۆتایدا ئەو جهودانە کۆدەکریتەوەلە چوارچیوەی پرۆژەی وورد وپلانی جیبەجیکردن ، بریتیە لە پرۆژە گەورەکەی (مەبەستی هەمو ئاین)کە بەرپا کردنی شارستانیە .

(36)

–

**حزبی سەرکردە(تاك حزبی)** حزب القائد (one-party system) Leading Party

**ئەوانەش دەگرێتەوە (ئۆتۆکراتی، پارتۆکراسی، قانون اقلية الحديدی، حزبی زال–مسيطر–dominant part)،فۆهەر، عەقلی ڕەوە، الدولة الشمولية،..) .**

حزبی سەرکردە جۆرێکە لە تاك حزبی و سیستەمی دیکتاتۆری ،تیایدا ئاستی حزب لە حکومەت تێدەپەڕێ بۆ ئاستی دەولەت ،جێی هەر3 دەسەلاتی(پەرلەمان وحکومەت وقەزا)دەگرێتەوە ، جاریش وایە ئەو 3 دەسەلاتە بە ڕواڵەت هەیە بەلام بە ڕێنمایی حزب بەستراوەتەوە ،پەیوەندیەکی یەك سایدی لە نێوان دەولەت وحزب دروست دەبێت،دەبێتە ڕێنماییدەری دەولەت ، لەو دۆخە دەولەتی حزبی سەرکردەی پێ دەووترێت ، بە عربی پێی دەوترێت (حزب القائد) ،بە ئینگلیزی ( Leading Party ) بە روسی ( партийная ) هەندێ جاری تر ناوی تریش نزیك لەحزبی سەرکردە هەیە پێی دەووترێ سیستەمی یەك حزبی(singlparty) ،ناوی تری وەك :پارتۆکراسی،حزبی زال dominant part،حزب تنظيم سياسي وحيد – political focal insittutional ...هەیە بۆ هاوتاکانی ، یان جار وایە حزبی شمولیشی پێدەگۆترێت ،ئەو دەولەتەی ژێریشی دەولەتی شمولی پێدەگۆترێت وەك لە (معجم الشامل)دەلێت (الدولة الشمولية statetotalitarianism) کە لەسەر تیۆری سیاسی یەك حزب دەڕوات .

حزبی سەرکردە کەمێك جیایە لە تاك حزبی وهەتا حزبی دیکتاتۆریش..،نزیکە لە سیستەمی ساتۆکراسی و سیستەمی من دەولەتم ودەولەتیش منم بە جۆریکی تری حزبیە،پۆستەکان لای حزب کۆدەبێتەوە ،لەناو حزبیش بۆ سەرکردایەتی ، زۆربەی پۆستە بالاکان لای یەك کەس کۆ دەبێتەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ،دەولەت لەدەست حزبە حزبیش لەدەست کەسێکە ،ئەزمونی حزبی سەرکردە زیاتر لە وولاتە عەقائدیەکانە ، پیشوو تر هەندێ ئەزمون لە رۆژئاوا هەبوە ،بەلام

پانتاییەکی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەنگی ساردو حزبە شیوعیەکان و حزبەکانی شۆڕشی رزگاری، سیستەمی سیاسی وولاتانی تازە پیگەیشتوەکان ،هەریەکە بە جۆرێك ، بابەتیکی زۆر ئالۆزنیە ،بۆیە پیناسی جیاجیای نیە ، پیناسی حزبی سەرکردەبەگشتی مەبەست لێی حزبێك بەتەنیا زۆربەی دەسەڵات بگرێتە دەست و بەپاساو و ناوی (حزب القائد)یان (حزب الطليعة) یان (حزب طبقة العاملة) گۆڕەپانەکە قۆرخ بکات، دیکتاتۆری ترین شێوەی حوکمە،کۆکردنەوەی چەمکەکانە (مۆنۆکراسی –ئۆتۆکراسی-ساتۆکراسی-دیکتاتۆری..) بە ڕێژەی جیاجیا،3جۆر پێناس بەنمونە تۆماردەکەین :

+ الموسوعة الميسرة للمصطلحات: حزب القائدى بە (حزب تنظيم سياسي وحيد – political focal insittutional )گوزارش کردوە[1105] .

+ قاموسی حزبی بەعس: جۆریکە لە بەڕێوەبردنی دەولەت و کۆمەلگە کە حزبی بەعس گرتویەتیە بەر بیئەوەی پرسی فرەیش فەرامۆش بکا.

+ پیناسی نازی(حزبی سەرکردەی ئەلمانیا) واکراوە : ڕێبازێکی تاکیانەی لیبرالی دەولەتیە، دەولەتیش لە ژێر فەرمانی حزبێك بووە، حزبیش لە ژێر فەرمانی تاکە کەسێك بووە بە ناوی (ڤۆهر – رابەر ) کە تیایدا ( ڕاوێژکاری و سەرۆکایەتی کۆمارو وەزارەتیش) کۆکردبۆوە لە دەسەڵاتی خۆی،

+ پیٚ ناسی (ئتحاد الترقی) حزبی سەرکردەی سەردەمی عوسمانی وا وەسفی کراوە : هەموو عوسمانی لەژێر دەستی ئیتحادیەکان، ئەوانیش لەژێر دەستی مرکز عام و ئەویش لەژێر فەرمانی أنورپاشا .

+فەرهەنگی سیاسی(ئارشی فارسی): بەو سیستەمانە ووتراوە کە حزب زالە ،زیاتر لەسەردەمی تاك حزب وحزبی سەرکردەی کۆمەنیستەکان هاتە کایەوە[1106] .

---

[1105] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسيه ص129 .

[1106] فەرهەنگی سیاسی(ئارشی فارسی) ل127.

+ المعجم الشامل-الحزب القائد: هي صاحب الدولة التي تسود فيها نظرية الحزب الواحد, حيث تكون إيديولوجيته هي الأيدلوجية الرسمية للدولة, ولا يسمح بقيام حزب آخر منافس أو معارض, ومطلوب من الفرد الولاء الكامل للحزب الحاكم[1107].

سەربردەی حزبەکانی سەرکردە : ئەو ناوانەی ئیمپراتۆرلە رۆمەکان وشاه لە فارس سولتان لە ئەمەوی و..هەریەکەیان سەربردەیەکی دروست بوونیان هەیە وێچووی حزبی سەرکردەیە ، جاروایە ناوو وسیفاتی سولتانی بە باپیرەی حزبی سەرکردە ناودەبرێ،ئەوکاتەی هەر3 نازناوی (خەلیفەو سولتان وامیر المؤمنین )کۆدەکرایەوە لە یەك کەس ، لەو دواییەش بە جۆری سەردەم 3 نازناو لە کمال ئەتاتورك کۆکرابۆوە (ئەتاتورك-غازی-میلی چیف) .

مێژووی حزبی سەرکردە کۆن نیە لەگەل هاتنی سیستەمی حزبایەتی هاتوە ، زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن کە حزب بەو پێناسەی ئیستا لە دەوری سالآنی (1850ز) دەست پێدەکات[1108] ، هەروەك (موسوعە علم الاجتماع)یش دەلێ: (هەتا سالی 1850 لەهیچ ولآتێك بەو مانا و پێناسەی ئێستا حزبایەتی نەبووە)، ئەگینا دەستە و یانە و کۆبوونەوە هەبووە،لەبارەی ئاخۆ سەربردەی یەکەم حزب جۆری حزبی سەرکردە بوە یان دیموکراسی، هەندێ جیاوازی هەیە ،ئەگەر یەکەمیان لە پیناو دۆزیکی مەزنی نیشتمانی دروست بووبیت ئەوە ئەو یەکەمە ،ئەگەر لە چوارچێوەی چالاکی پەرلەمانی دروست بووبێت ئەوا یەکەم نیە، نیکۆلا میکافیلی لە ڕەوتی باسی (میرنشینە ئاینیەکانی ئیتالیا) ناوی دوو حزب دەبا بەناوی(ئۆرسینی) وحزبی (کۆلۆنا)[1109]، باس لە سەرەتایەکی تری حزب دەکرێ لە نێوان (22-27)ی مایۆ 1875 لەکۆنگرەی غوتا هەردوو بالی کریکارانی ئەلمانیا(پارتی کریکارانی دیموکراسی)بەسەرۆکایەتی پیپل و(یەکێتی کریکارانی ئەلمان)ی یەکیان گرتەوە بوە (پارتی کریکارانی سوشیالیستی ئەلمانیا) دروست بوو ، بە پێی (الموسوعە السیاسیە)یەکەم حزب لە جیهان حزبی

---

[1107] عبدالمنعم الحفني- المعجم الشامل ص445 .
[1108] موریس دیفریجة -الأحزاب السیاسیة-تعریب:عبدالحسن سعد، ط2 \1977م، دار النهار للنشر ص6.
[1109] نیکۆلا میکافیلی- الآمیر-ص114

دیموکراسی ئەمریکی بە سەرۆکایەتی جیفرسونی سەرۆك کۆماری ئەمریکی لە نێوان (1801-1809)،ئەوەش حزبێکی دیموکراسی بوە .

بەشێك پێیان وایە دروست بوونی سیستەمی سەرۆکایەتی دەولەت جاریکی تر هانی سەرهەلدانی حزبی سەرکردەی داوە ، بەشیکی تر پێیان وانیە چونکە ئەوانەی سیستەمی سەرۆکایەتین تا ئیستاش دیموکراسی و دەست گۆڕی دەسەلاتیان بەردەوامە ، یەکەم جار سیستەمی سەرۆکایەتی مۆدیرن لە ئەمریکا تاقیکرایەوە ،بە پێی ئەو دەستورەی فلادیلفیای سالی 1787 ویەکەم کەسیش ئەو ناوەی لەو سیستەمە نا (وولتەر باگۆهۆت) رۆژنامەنوسی ئینگلیزی بوو[1110] ، لەبەر سەرکەوتنی بوە بەشیك لە نەریتی سیاسی وولاتان بەخێرایی گەیشتە مەکسیك وئەرجەنتین و زۆربەی وولاتانی ئەمریکای لاتینی،ئینجا بۆ فلیپین ولەو دواییەش بۆ تاجیکستان وکازاخستان (ئەوانە نمونەی زۆر سەرکەوتو نەبوون)..جیاوازیەکەی ئەوەیە هەموی لەدەست سەرۆکە سەرۆك وەزیرانی نیە ، وەزیرەکان سەرۆك دیاری دەکا نەك کۆنگریس ، ئەو زەمینە دەستوریە نزیکە لە سیستەمی ساتۆکراسی - بە مانای هەمو چالاکیەك بۆ دەولەت (سەرتاپای) هەموی لە پیناو دەولەت ، هەروەك ووتارەکەی مۆسۆلینی لە28ئۆکتۆبەر1926 میلانۆ ووتی نابی هیچ چالاکیەك دژ بەدەولەت قەبوول نیە ، ئەوەش یەکیکە لە تایبەتمەندیەکانی فاشیەتی مۆسۆلینی[1111] ، ئەو پرۆسەیەی نێوان سیستەمی سەرۆکایەتی و سیستەمی ساتۆکراسی(یان باقی دیکتاتۆریەکانی تر) لە ڕێسایەك دێت لەلایەن (رۆبیرت مایکل)لە 1912 دارڕژرا یەو دەلیَ: ئەگەر دەست گۆڕی دەسەلات نەبێت ئەوا بەرەبەرە دەسەلاتی مەدەنی ومیلی بۆ دەولەت قۆرخ دەکرێت ،لەویش بۆ حکومەت ،بەرِەوتی سروشتی بەرە بەرە لە حوکمی زۆرایەتی وبۆ کەمایەتی ،لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك ،لە چەند کەسێك بۆ تاکە کەس ، ئەو ڕێسایە پێی ووتوە (قانون اقلیە الحدیدی)[1112] ، لە (موسوعە المیسرە) ناوی ناوە (القانون الحدیدی للاولیکارکیە-iron law of oligarchy) دەلی بە سروشتی بەشەری کارەکان لە بەکۆمەلەوە

---

[1110] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية –د احمد سعيفان ص393

[1111] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية –د احمد سعيفان ص201

[1112] -p 226Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts

بەرەو کەمایەتی ولەویش بۆ تاکە کەس دەچێت[1113]، بەجۆریکی تر(رۆبیرت میشلیز)دەلێت زۆربەی سەرکردە حزبیەکان جم وجۆلی سیسیان لەسەرەتا بە کۆدەنگیە بەلام بەرەبەرە لاردەبنەوە بۆ تاك ڕەوی وئۆلیگارکی وبەرژەوەندی شەخسی، لەوەوە حزبی سەرکردە دروست دەبێت وهەرلەوەشەوە فلسفەی دەست گۆڕی دەسەلات وپیویستی دیموکراسی هاتتە کایەوە .

ئەو یاسایەی (رۆبیرت مایکل)و(میشلیز) ڕێك لەگەل وەسفی (علی فوئاد- عسکری ترکی)کەلە یاداشتەکانی خۆی لە بارەی گەشەی (ئیتحادترقی) نوسیویەتی :((کانت العثمانیة في قبضة الإتحادیین، والإتحادیون في قبضة المرکز العام، والمرکز العام في قبضة الحکام الثلاثة، والثلاثة في قبضة (انور) یسوقهم سوقاً عنیفاً))[1114]، هەموو عوسمانی لەژیر دەستی ئیتحادیەکان، ئەوانیش لەژیر دەستی مرکز عام و ئەویش لەژیر فەرمانی(سیَ سەرکردەکە:ئەنوەر پاشا-جمال پاشا-تەلعەت پاشا)بوو ئەوانەش لەژێر کۆنترۆلی أنورپاشا ، بۆیەش لە سەرچاوە ئەلمانیەکان لەو دواییە عوسمانی بە (بلاد انور)ناوزەد دەکرا، بە هەمان شێوە حزبی بەعس ئاوا دەولەت لە ژێر فەرمانی حزبێك ،حزبیش لە ژێر فەرمانی تاکە کەسێك بووە ، لە پیشوو ئەو تاکە ناوی نرابوو(ڤۆهر– رابەر )، هەندیَ حزبی ناشیۆنا لیزمی وەك(کاربۆناری ئیتالیاو ئیتحادوتەرەقی..) وەك حزبی سەرکردە کاری کردوە ، ئەو حزبە ئەز مونی زۆری نەخایاند بۆیە نەبوە سەرمەشق ،ئەوەی زۆر کاریگەری بوە ئەزمونی جۆری حزبی مەرکەزی زیاتر بۆ بەلشەفی بەسەرۆکایەتی لینین دەگەرێتەوە کەلەدوای 1917 هەلبژاردن کرا بلشفی 175 کورسی هێناو سۆشیال دیموکراس 410ی هینا،حکومەتیکی ئیئتلافی دروستکرا لەهەردوو لا ، دوای لینین دۆمای هەلوەشاندەوەو بنەمای (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا)و سۆڤیەتاتی پەیڕەو کرد بە تاك حزبانە ،دوای مەکتەبی سیاسی داهێنا لە 1923 ،ئیتر حزبە شیوعیەکان بە پەیامیکی خەستەوە دەستیان دەگرت بەسەر دەسەلات ودەولەت و سیستەمی حزبی سەرکردەیان بەتەواوی داهێنا ، بەشێك دەلێن خراتریش لە حزبی سەرکردە چونکە عادەتەن سیستەمی وا هەندیَ ووردە

---

[1113] موسوعة المیسرةللمصطلحات السیاسیة–جزء(ق) ص32 .

[1114]حرکة الإستقلال العربي– دراسةتأریخیة فی مفهوم الإستقلال فی فکرالأحزاب والجمعیات العربیة1908–1919)ص130.

حزبی کارتۆنی شان بەشانی حزبی سەرکردە ئیش دەکات ،بەلام دەولەتە سۆشیالیستیەکان ئەوەشیان نەهیشت .

هەرچی حزبە ناشیۆنالیزمەکانە لە سەرەتای سەدەی بیستەم و پیش جەنگی جیهانی دوەم سەریان هەلدا ، نازی وفاشی و ڤالانژیس و ..، ئینجا قۆناغی حزبەکانی رزگاری خوازدێت ، بەلام (موسوعە المعرفە )دەست نیشانی یەکەم حزبی سەرکردە دەکاو دەلێت: (حزبی ترۆویگ)کە لەلایەن ئەمریکیە هاتوەکانی لایبریا دروست کرابوو ، یەکەم ئەزمونی حزبی سەرکردەیە لە جیهان نزیکەی سەدەیەك لە دەسەلات بوون (1878-1980)ئینجا بە تۆبزی لادرا .

جیاوازی حزبی سەرکردە لەگەل سیستەمی تاك حزبی ئەوەیە حزبی سەرکردە چەند حزبیکی بچوکی دەستکرد دروست دەکا، یان پیشوو تر پیش دەسەلات لەگەلی بوە، هەروەك ( Amoder Dictionary Political Analiysis)و جیۆڤانی سارتۆری لە کتیبی(الأحزاب وأنظمة الأحزاب) ئەو جیاوازیەیان کردوەو دەلێن حزبی سەرکردە حزبی تری لەگەلە[1115]، بەلام خۆی خاوەنی هەمو بڕیارەکان دەبێت، لە (قاموس حزب البعث) دەلیّ حزبی سەرکردە وەك تاك حزبی نیە ، حزبی تریشی لەگەلە فرەییە[1116]، دەشلیّ لە جهانی سێیەم ئەو حزبە نوینەرایەتی هەمو چین وتوێژو رەگەزەکان دەکا پیویستی بە حزبی تر نیە .

لینین لە کتیبی (الدولة والثورة)دەلێت رۆلی سیاسی حزبی سەرکردە لە یەکیتی سۆڤیەت بەدیلی نیە ، ئەگینا شیوعیەتمان نایەتە دی ، هەمان ئەو حزبی سەرکردەیەش رۆلی پیشڕەوایەتی دەبینی ، وەك (ماندل)دەلێت پیشڕەوی حزبی سەرکردە زامن دەکا[1117]،کەچی هەندیّ جار حزبی سەرکردە ڕەت دەکەنەوە ، بیرۆکەی (پیشڕەو)ایەتیان داهێنا بەتایبەتی تیۆرەکانی (ماوتسی تۆنگ)،پیشیان وایە چینی کریکار پیشڕەوی گەشەی کۆمەلگەن و زۆرایەتیشە ...کەواتە پیویستیان بە حزبی تر نیە ،بەو ڕوانگە هەر حزبیکی تر هەبێت ئەوە میژوو دوا دەخاو چەمکی (رەجعیەت)لەو قوولاییە دێت ،

---

[1115] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts287-p

[1116] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص30

[1117] إرنست ماندل- النظرية اللينينية في التنظيم- ترجمة: كميل داغر الناشر: دار الطليعة – بيروت ص34 .

هەردوولاشیان جیاوازیان هەیە لەگەل ئەو حزبانەی بەچالاکی ودیموکراسیانە دەنگی زۆر دەهێنن دەبنە تاکە حزبی دەسەلات وەك حزبی دادو گەشەی تورکیا وسەرکەوتنە دیموکراسیەکانی(سەرەتالەحزبی سەلامەی وەتەنی48کورسی هیناسالی 1973کە دەکاتە 11٪،دوای لە 1977 کشایەوە بۆ 8٪..ئینجا ریفاه ودوای دادوگەشە توانی بگاتە دەوروبەری 50٪) وبەتەنها حکومەت پیکبهینی ، مۆریس دوڤریجی لە کتێبەکەی (احزاب السیاسیە) ناوی لەو جۆرە حزبانە نا (حزبی زال-مسیطر-dominant part) بۆ لیك جیاکردنەوە لە گەل حزبی سەرکردە ، لە (المعجم الحدیث للتحلیل السیاسي) جیاکردنەوەیەکی تری کردوە ، دەسەلاتی ڕەهاو دەسەلاتی دیکتاتۆری لێك جیاکردۆتەوە ،بەوەی دەسەلاتی ڕەها پابەند نابێ بە یاساو دەستور ،بەلکو دەلێ پەیامی میلەت ومیژووم هەلگرتوە گەورەترە لە دەستورویاسا ،هەرچی حزبی سەرکردەیە دەستوریشی بە ڕێنمای حزب بۆ دێت [1118] ، حزبی سەرکردە دژی لیکجیاکردنەوەی 3 دەسەلاتەکەSeparation of Powers بوەووەك لە(موسوعةالمارکسیة)دەلێ:لۆك یەکەم جار پیشنیاری کردو مۆنتیسیکۆ گەشەی پێدا ،ئەوەش بنچینەی ئایدیۆلۆجی برجوازی پیکدەهێنی ،بۆ بناغەی دەسەلاتیکی هاوبەشی بورجوازی وئەرستۆکراسی(- هەرچەندە ئەرستۆ حکومەتی ئەرستۆکراسی بە حکومەتی باش وەسف کردبوو ،ئەریستۆن بەمانای باش لە زمانی ئەگریکی)،بۆ ئەوەی دەسەلاتی تەنفیزی زیاتر دەستکراوەی ڕەها بێت .

<u>ڕێگاکانی گەیشتن بەدەسەلات :</u> زۆربەیان لە ڕێی پرۆسەیەکی میژووی وەك رزگارکردنی وولات لە ژێر داگیرکاری گەیشتون، هەندیکیشیان بە ئینقلاب و شەڕدەسەلاتیان گرتۆتە دەست ، جاریش وایە بە دوو سەرچاوە هاتوە ،بەهۆی یاساو جاریش وایە بە هەلبژاردنی دیموکراتیش بوە ، یان رژیمیکی سەربازی ، لەدەستوری حزبی بەعس (تەئسیسی) (کە لە4-1947/4/6 دەرچوە) لەدیباجەکەی ئەو دروشمە واتۆمارکرا:البعث العربي الاشتراکي حرکة قومیة شعبیة انقلابیةتناضل في سبیل الوحدة العربیة والحریة الاشتراکیة، نامۆترین پێناس لەبارەی حزب پێناسی (حزبی بەعس)ە لە فەرهەنگەکەیان (تعریفات ببعض المصطلحات) هاتووە: حزب بریتیە لە کۆبوونەوەی خەلکانێك لەنێو

---

[1118] المعجم الحدیث للتحلیل السیاسي ص19

بەرنامەیەك بۆ دەست بەسـەراگرتنی دەسـەلاّت و ڕاپەڕانـدنی دەوڵـەت بـەپێی ئـەو بەرنامەیـە بـۆ هێنانەدی ئامانجەکانی[1119].

حزبی نازی ئەلمانی لە ڕێی هەلبژاردنی دیموکراتیانە گەیشتە دەسـەلات ، لـە سـالّی 1933 بـە هەلّبژاردنێکی دیموکراسیيانە هیتلەرو حزبی (نازی ) (288) کورسی بەدەست بهێنـێ وبـە دەنگـی یەکەم دەرچێت لە پەرلەمان- ڕاینشتاخ ، هیتلەر بـووە (ڕاوێـژکار و سـەرەك وەزیرانـی ) ئـەلّمانیا، هەموو حزبەکانی تری هەلّوەشاندەوەو بووە خاوەنی 8 ملیۆن ئەندام.

بە پیی (الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسيه ) ئەو جۆرە سیستەمە دژبە فرەیی لە وولاتانیکی تازە رزگاربوو دیت ..عادەتەن ئەو وولاتانەی کە حزبیك زیاتر رۆلی لە سەربەخۆیی بینیوە [1120]،دوای بەرەبەرە بێدەسەلاتی کردوون وتوومەتی جۆراو جۆری کریگرتەی بێگانەو تیکدانی ئاسایشی وولات وەك پاساو بۆ لەناوبردنیان کراوەو یەك حزب لە مەیدان ماوەتەوە ، حزبە شیوعیەکان لەو ڕووەوە ڕاشکاوانە تر هەمو حزبێك بەدەر لە خۆیان بە رجعی وکریگرتەی ئیستعمار لیستاندراوەو بواری ئیش کردنی نەبوە ، بە ڕوونیش دەلێن یەك حزب مافی نوێنەرایەتی چینی پرۆلیتاریا هەیە ، بۆیەش شیوعیەت 5 بنەمای هەیە لە مادەی دوەمیان (حزبی سەرکردەیە-پیشڕەو)، دەقەکەی (ثانيا :نظام الحزب الواحد ، وهو التعبير الحقوقي لنظرية الطليعة الثورية - عماد اللينينية ، وروح الاشتراكية ) .

زۆربەی میکانیزمی لەدایك بوونی حزبی سەرکردەلە رپسایەکەی (رۆبیرت مایکل) نزیکە کەلەسەروو بەجۆریکی ترئەو ڕێسایە باس کرا،کەلە 1912 داڕژراودەلیٚ: ئەگەر دەست گۆڕی دەسەلات و دیموکراسی معارەزەیی نەبێت ئەوا بەرەبەرە دەسەلاتی مەدەنی ومیلی بۆ دەولەت قۆرخ دەکرێت،لەویش بۆ حکومەت ، لە حوکمی زۆرایەتی وبۆ کەمایەتی ،لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك ،لە چەند کەسێك بۆ تاکە کەس ، ئەو ڕێسایە پێی ووتوە (قانون اقليه الحديدى)[1121] ، یان (القانون

---

[1119] تعريفات ببعض المصطلحات السياسية — المادة:حزب

[1120] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص176

[1121] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts 226-p

الحديدى للاوليكاركيه-iron law of oligarchy) ، تەنها ئەوەیە ناوی حزبی سەرکردە بخە شوێنی (چەند کەسەکە)کە لە ڕیساکەی مایکل هاتوە .

حزبی سەرکردە –ناسنامەو پاساو:

سیستەمی حزبی سەرکردەو تاك حزبی پانتایەکی فراوانی لە مێژووی نوێدا پڕکردۆتەوە، نایەڵێت هیچ حزبێکی تریش بەشداری ڕاستەقینەبکات، یان جارجار وەك (دەڤەری) و بەناو هەندێ وورده حزبی دروست کراویان بەشداری کردووە ،ئەو حزبە بچوکانەش رازین بە بوونی حزبی سەرکردە، لە عیراق سەردەمی حزبی بەعس هەندێ وورده حزب هەبوو بەناوی (مستقلین- حزبی شیوعی –پارتی دیموکراتی کوردستان –حزبی شۆڕشگێڕی کوردستان –بزوتنەوەی پیشکەوتنخوازی کورد)،لەوەوە مانای حزبی سەرکردە تەواو دەبێت ، واتە هەم لەناو میلەت سەرکردەیە هەم لە ناو حزبەکان ، لە جیهانی رۆژهەلأت و جیهانی سێ یەم رەواپەتی پێدرا بوو,هەروەك لە(الموسوعة الميسرة للمصطلحات ) جۆريك لە ناسنامەی جوگرافی بۆ دیاری کردوون دەلێ لە وولاتانی تازەپیگەیشتوو ویان رزگارکراو هەن ،دژ بە فرەيين ،ناویشی ناون یەك حزبی(singlparty)، حزبە شیوعیەکانیش هەروا پۆلین دەکا [1122].

وولأتانی سۆشیالیستی بە ئەرکی شیوعیانەیان دەزانی و کە دەبێت حزبی پرۆلیتاریا و دیکتاتۆری بێت بۆ وەچەرخان بەرەو شیوعیەت، بەو شێوە سیستەمی تاکە حزبی لە هەموو وولأتانی سۆشیالیستی پەیڕەو دەکرا، لە مارکسیەت حزب نوێنەری چینە, بۆیە لە ماددەی (6)ی دەستوری 1977تەرخان کراوە بۆ دەوری حزبی شیوعی , یەکیکیش بوو لە پێنج بنەماکانی هێنانەدی شیوعیەت ، هەرچی وولأتانی تری جیهانی سێ یەمە هەر هەموی بەرەو سیستەمی تاك حزبی وحزبی سەرکردە نەرۆیشتون وەك واباوە ، بە دوو ئاڕستە رۆیشتوون، هند, پاکستان, تورکیا, نایجیریا, هەندێ وولأتانی تر... بەرەو دیکتاتۆری وحزبی سەرکردە نەرۆیشتن ، جاریش وایە لەو جیهانەی سێیەم تاك حزبی بوە بەلام سیستەمی حزبی سەرکردە نەبوە بەلکو هەلبژاردنی دیموکراسی ئەو دیزاینەی داوە ،لە هەلبژاردنی سەنگافورای سالی 1976 لە کۆی 38 کورسی 37ی هیناوە

---

[1122] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ص176 ،

حزبەکەی لی کوان بەناوی (حزبی کاری میلی سەنگافورا) بەتەنها دەسەلاتی گرتوە نەك لە ڕێی ئینقلاب ئەو جۆرەی بزوتنەوەی رزگاری خواز[1123] (لی کوان)دەلێ دوای ئەوەی لە قەیرانەکان وقۆناغی گواستنەوە_دەرچووین خۆمان حەزمان کردلە هەلبژاردنی 1984دوو کورسی بدۆڕینینە (جیرنتام ئەمینداری گشتی پارتی دیموکراتی سەنگافورە بۆ ئەوەی یەك حزبی سەرکردەو تاك حزبی دروست نەبێت[1124] ،

..لە جەزائیریشلە هەلبژاردنی سالی 1990 بەرەی ئینقازی ئیسلامی لە 86٪ ی دەنگیان هێنا و بێ پێویستی بە هاوپەیمانی لەگەڵ هیچ حزبێکی تر، (بەرەی ئنقازی ئیسلامی جزائر) بە سەرۆکایەتی پرۆفسۆر عەباس مەدەنی دەیتوانی حکومەت پێك بهێنێت بەهۆی خزمەت و دڵسۆزیەکەی بەردەوام بێت، هەروەها لە تورکیاش لە فرە لایەنیەوە (حزبی دادو گەشە) دەنگی تەواوی هێنا وەك تاکە حزب لە دەسەڵاتدا ....بەلآم ئەزموونی جەزائر بە دیموکراسیەوە لە لایەن دەسەڵاتی سەربازیەوە وەرگێڕدراوە بۆ دیکتاتۆریەوە ،ئەوانە هەموی نمونەی جیهانی سێیەمن کە بە ئاڕستەی جیا ڕەویان کراوە .

ئاڕستەی دوەم زیاتر بەلای تاك حزبی وحزبی سەرکردە چوە ، چەند هۆو پاساوێکی ڕاستەقینەوکردبووە بیانۆ بۆ بەردەوام بوونی حزبی سەرکردەو تاك حزبی, لەوانە بارودۆخی پەیدابوونی ئەو حزبە و رزگارکردنی وولات, ئینقلاب کردن بەناو ومەبادیئی شۆرش, یان بارودۆخی وولات و ترسی دەرەکی (خطر الخارجي)و بە بیانۆی یەکخستنەوەی هێزە نیشتمانیەکان, یەکێتی وولات و ئیتر بەو بیانۆیانە گەورەترین دەستی کوشندەیان لە میللەتانی خۆیان و حزبە سیاسیەکانی وەشاندەوە، هەردەم زیندانی پڕبووە, ... هەندێ پاساوی تر دەهێننەوە لەلایەن هەندێ نوسەرو ڕۆشنبیرانی سەردەمی تاك حزب گوایە قۆناغی ناسکی وولات و نەخەملینی چینەکانی بەتەواوی وکەمی ووشیاری خەڵك و پێ نەگەیشتنی دیموکراسی گەشەی ئابووری وولات و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و دوژمنانی ...پاساوی سیاسی ونیشتمانی ئەو جۆرە سیستەمانە بوە،خەریکە ئەو جۆرە حزب

---

1123 [1123] لی کوان- من العالم الثالث الى الاول ص169.

[1124] لی کوان- من العالم الثالث ال الاول ص171

وسیستەمە کۆتاییان پێبێت ، خراپترین سیستەمیان لە جهانی عربی ماوە ئەویش وا شۆڕش وبوهاری عەرەبی لیٚ سەریهەلداوە ، لەو سەردەمەی ئەگەر بەسەربەستی و دیموکراسیانەی هاتبنە ژێر باری هەلٚبژاردن بە خراپترین شێوە دۆڕاندوویانە, بە شێوەیەك لە زۆربەی وولاٚتان لیٚ یان هەلٚسان و تەختیان وەرگێران ،لەزۆربەی وولاٚتانی سۆشیالیستی, لە هەندیٚ وولاٚتیش لە هەلٚبژاردن تەنانەت یەك کورسیشیان بۆ نەهاتووە لە (نیکاراگوا)بەرەی ساندنستا بە سەرۆکایەتی (ئۆرتیگا)دۆڕاندی، لە لە 26\دیسمبر\ 1991 ی هەلبژاردنی جەزائیر بەرەی رزگاری(جبهه التحریر ) تەنیا لە25 کورسی هێنا ئەوەندەی هێنا لەبەرامبەر بەرەی ئیسلامی180کورسی هێناکەدەکاتە لە 86٪ ، ئێستاش بەشێکی زۆر ماوون لەوانە (کوباو, ڤیتنام, چین و, کۆریا, .... )هەروەها لە جیهانی عەرەبی کە زۆربەشیان سەربە رۆژئاوایین .

ئەوانە زۆر بە تواناشن لە داتاشینی ناوو ناتۆرەو توومەت، هەلٚخەلٚەتاندن وگەلالە کردنی هەلبژاردنی ساختەو کار بەدەستورو راپرسی بە (بەلٚی و نەخێر)،تەنانەت شیوعیەکان دیموکراسی رۆژئاوا بە دیموکراسی برجوازی وەسف دەکەن ودیموکراسیەکی تایبەت بە حزبی سەرکردە دابهێنن بە ناوی (دیموکراسی ناوەندی)یان دیکتاتۆری بەناوی دیموکراسی .

رۆژئاوا تا ئەو دواییە سیاسەتیکی زۆر تایبەتی لە جیهانی ئیسلامی پەیڕەو دەکرد ، تەنها لایەنی سلبی رۆژئاوایان بۆ جیهان دەنێرین, سیستەمی خۆی دیموکراسیە کەچی پشتیوانانی دیکتاتۆریە ، دوای گەشەی جیهانی ئیسلامی ئەو دیاردەیە لەناو وولاتانی عربی قەتیس ماوە ، رێك ئەو سنورەی پێی دەووتریٚ رۆژهەلاتی ناوەڕاست و سەرووی ئەفریقا ،کە زادەی سایکس پیکۆو ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیلن ، لە کات وساتی ئیستادا خەریکە رۆژئاوا دەست بەرداری ئەو سیاسەتە بێت بەرامبەر وولاتانی عربیش بەلام هیشتا ئیسرائیل کار لەسەر مانەوەی سیستەمی حزبی سەرکردەو تاکڕەوی دەکا لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست .

بەکورتی ناسنامەو سیفاتی ئەو جۆرە حزبانە بریتین لە : 1- ئیعتمادکردنە سەر هێزو دەزگای ئاسایش 2-پۆست وئیمتیازبۆ ئەندام ولایەنگرانی 3-وێنەکردنی مەترسی دەرەکی هەمیشەیی 4- کۆمەلێك سیفاتی تر وەك تیکەل کردنی دەسەلاتەکان وبەستنەوەیان بەدەسەلاتی حزبی و پیرۆزی کەسی یەکەم وهەردەم هەلچوون ویادکردنەوەوئاهەنگ وسەرکەوتنی وەهمی و ..

**پاساوەکانیان** : زۆربەی دیاردە سەلبییەکانی حوکم پاساوی خۆی هەبوە ،کەم هەبوە بلێ ئەوە هەلەیەو کەچی دەشیکەم ،بەشی زۆری منەتیشی کردوەو لە پێناو میلەت وبەرژەوەندی گشتی و کۆمەلیك لەوتەنزیراتانەی داتاشیوە ،هەندێ جار جۆرە ئایدیۆلۆجیایەکیشی لەگەل بوە یەکجاری خەستی کردوە،وەك حزبە ناشیۆنالیزم وئومەمیەکان ، جاریش وایە پاساوەکە فەرهەنگی بوە ،وەك (مۆبۆتۆ) پاگندەی کرد وگوایە لەکاردانەوەی فەرهەنگ وئایدیۆلۆجیای داگیرکەر لە دوای سالانی 1971هەستا بەدروست کردنی سیستەمیکی پۆلاینی تاك حزبی (جولانەوەی میلی بۆ شۆرش- de la Révolution Mouvement populaire ) ،لە پێناو دروستکردنەوەی فەرهەنگیکی زائیری جیا لە ئیستعمار و داگیرکەر، ناوی وولات وڕووبارو شوینە گشتیەکانی گۆڕی وزمانی (لینگالە)ی سەپاند ، پەڕیەوە بۆ جل وبەرگ وناوو نازناوی ئەفریقی و بەرەو دەستکاری ئاینیش رۆیشت وخستیە پرۆگرامی خویندنیش ،ناویشی لەخۆنا (بانگا مۆبۆتۆ سیسی سیکۆ کوکو نگباندۆ وازا) بەمانای مۆبۆتۆی تیکۆشەری سەرکەوتو هەرسەرکەوتو بیئەوەی کەس بیوەستینی ،هەرچی حزبە شیوعیەکانە پێیان وابوو حزب نوێنەری چینێکە، چینەکانیش لە ناکۆکی (مان و نەمان)دان لەگەلێ یەکتر، بوونی یەکیان نەبوونی ئەوی ترە، بۆیە فرەلایەنی بەڕای مارکسیەت دیاردەیەکی ڕۆژئاوایی و لە خزمەتی سەرمایەداری و چینی برجوازیە، لە جیاتی فرەلایەنی فکرەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا هاتەدی[1125]، بەو شێوەیە پاساوی شیوعیەت(بۆ حزبی سەرکردە) بەناوی رزگاری پرۆلیناری، پاساوی نەتەوە گەریەکان بە ناوی یەك خستن و رزگاری، .. یان زالیەتی، یان پاساوی تری وەك باری ناسکی میللەت، پلانی دوژمن و ئیمپریالیزم، پاساوی حزبی نازی بریتی بوو لە :

دواکەوتنی یەکخستنەوەی ئەلمانیا تا سالی 1871ز.

ئەوەش بووە هوی دواکەوتنی بزوتنەوەی تەکنیك وسەرمایەداری .

لەبەر هەمان هو بەشی لە (مستعمرات ) کەم بوو .

هەرچی حزبی بەعس (6) پاساوی بۆ ئەو مەبەستە و (حزب القائد) هێناوەتەوە :

خوی شورشی کردووەو سەرکردایەتی ئەو پیرەوی دەکا .

---

[1125] بۆ زیاتر سەرنج بدە ::أ- مبادئ الشوعیة- انجلس ب. بیان الشوعي- انجلس- مارکس ج. الدولة والثورة- لینین د- نظم السیاسیة ص227

ئامانجەكانی ئامانجی میللەتیشن .

توانایەی گەیشتن بەو ئامانجانە تەنها بەو حزب و سەركردایەتی یە دەكری.

زورایەتی خەلكیش لە دەوری ئەو رێباز و سەركردەو حزبە یە .

سەركردەكەی هەم سەرەك حزبەو هەم سەرۆكی میللەتیشە .

بەتەنهائەوان ئەو بەرپرسیاریەتەیان پیێ هەلدەگیریێ بە خەلكی تر ناكریێ.[1126]

زۆربەی حزبە سەركردەكانی تر جۆرە پاساو وتەنزیراتیكی هاوبەشی هەبوە، گرنگ ترین پاساوەكانیان:

1-پیشڕەوایەتی: گوایە پیشڕەوی میلەتێك یان نەتەوەیەك دەكا بۆ ئامانجی مەزن ،وەك حزبە نەتەوەیەكان و پەیدابوونی (تۆرانی ونازی وفاشی و بەعسی ..) ،بە جۆریكی تریش حزبە ماركسیەكان پیشڕەوایەتی گەشەی تەواوی كۆمەلگەیان دەكردو لەلایەن میژوەوە (تەفویزیان پیێدرابوو )جۆریك بوو لە سیۆكراتی مادی ،ئەگەر سیۆكراتی ئاینی تەفویزیان لای خودای خۆیان بوو ئەوە لای شیوعیش كە لەجیاتی خودا سروشت ئەو رۆلەی دەبینی تەفویزی پیدا بوون كە پیشڕەوایەتی كۆمەلگە بكەن ،بە هۆی نوینەرایەتی پرۆلیتاریا كە پەیامیكی حەتمیەی میژوویی هەلگرتوە ،بەخەلكی تر ناكریێ جگە لە حزبە شیوعیەكان .

2-بەرژەوەندی فراوانترین جەماوەر: ئەوەش پاگندەیەكە حزبی سەركردە دەیكا ودەلیێ من نوینەرایەتی هەمو چین وتویێژولایەنەكان دەكەن ،بە هۆی هەلگرتنی پان نەشیۆنالیزم ،لە حزبە شیوعیەكانیش نوینەرایەتی فراوان ترین چین دەكەن ، چینی كریكار ، ناویشی ناوە دیكتاتۆریەتی زۆرایەتی .

3- ئامانجە میژووییەكان : بۆ حزبە ناشیۆنالیزمەكان گەیاندنی پەیامیك كە گوایە ئەو ئومەتە هەلی گرتوە میلەتانی تر هەلیان نەگرتوەو پیویستیشیان پێیە ،هەرچی شیوعیەكان بوو پەیامی (حتمیەی تاریخی)دادگەری وبەهەشتی شیوعیەتیان پیبوو ،حزبەكانی تر ڕێگری بەهەشت دەبوون و ڕاپیچی خەلكیان بۆ دۆزەخی سەرمایەداری دەكرد،بەوشیێوە تاك حزبی شیوعی دەبوە پیویستیەكی میژوویی، كە لە كۆتاییدا دەبووە دیكتاتۆری تاكە شەخس و تاك حزبی بە تەواوی ماناو سیفاتی دیكتاتۆریەو، لەسەر ئەو بنچینەیە لە ولاتانی سۆشیالیستی تەنیا بوار بە(حزبی شیوعی)دەدرا .

---

[1126] بروانه : تعریفات ببعض المصطلحات ــ مادة : حزب القائد

4-پەڕینەوەلە قۆناغیکی سەخت : جگە لەوەی پاساویان ئەوەیە کە پەیام و ڕزگاریان پێیە بۆ قۆناغێکی میللەتەکەیان یان یەکجاری، گوایە پەڕینەوەو دەرباز و جێبەجێکردنی ئەو پەیامە تەنها بەو حزب و سەرکردەیە دەکرێ ....لەوانە حزبە ناسیۆنالیزمەکانی نازی و فاشی، شۆفینی، فالانژسی، بەعسی، تورانی، ...هەروەها چەپیەکان وجاروایە هەندێ باڵی ئیسلامی سەلەفیش ئەو باوەڕو پاساوەی هەیە، حزبی بەعس لەو بارەیەوە باس لە بارودۆخیکی ویرانی عربی وپارچەپارچەیی دەکا،بە (متخلف)وەسفی دەکا،جیهانی عربی بۆ 4 لا دابەش کردە ،1-ئەو رژیمانەی بەیەکجاری چارەنوسی خۆی داوەتە دەست ئیمپریالیزم 2-جۆرە رژیمیکی تری تەبەعی دوور لەڕەچاوی بەرژەوەندی ئومەی عربی 3-رژیمەخینەتکارەکان 4-کۆمەلە رژیمیکی دواکەوتوی کۆنەپەرست[1127] .

بە پێی ئەو پاساوانە حزبی سەرکردە خاوەنی ئایدیۆلۆجیاو سەرۆکەکی زۆر زاڵ دەبێت ،دیسپلینی حزبی پۆلایین دەبێت ،ئەندام ولایەنگرانیان شێوەیەك لە توانەوەی شەخسی لەو حزبە ئەنجام دەدرێت،زۆر جار هەیە بێئەوەی ئاگاداری بابەتەکە بێت یان قەناعەتی هاتبێت چی حزبەکەی ووتی ئەویش ئەوە دەلێتەوە ،بۆیە گەلێ جاری تریش ئەندامانیان تووشی جۆرێك لە عەوامیەت وگەوجاندن دەبێتەوە ،دەکەوێتە دۆخیکی سایکۆلۆجی وا کە تیۆرەکانی دورکایمی بەسەر پەیڕەو دەبێ لەبارەی عەقلی ڕەوە(عەقلی دەستە جەمعی) ،ئەو جۆرە عەقلیەتە بە عەقلیەتی ڕەشۆکی و (غەوغا) ناودەبرێت ،بەبیعەلانە کاریك دەکا لەو کۆمەلە دوورکەویتەوە ئەوەناکاو دژی دەبێت .

**حزبی سەرکردە لە دەستوردا**: بۆ جیبەجیکردنی وەها بەرنامەیەك(کە لەسەروو باس کرا) پیویستی بە حزبیکی پۆلاین ومەرکەزیانەی هەیە دەولەت بەتەواوی لەبەردەست بێت ، لەوەوە دەولەتی یەك حزبی وحزبی سەرکردە دەبوونە یەك مانا ، ئیتر ئەو حزبە نزیك دەبۆوە لە مەفهومی سیۆکراتی بە جۆریکی تر ،تەفویزی لەدەستورو نیشتمان وئومەت وپەیامی میژووی وەردەگرت ، بە یاساقەدەغەی چالاکی تر دەدرا وەك لەسەروو تۆمارکرا ، (حزبی گەل) بەسەرۆکایتی ئەتاتورك لە 29ی ئۆکتۆبەری 1923

---

[1127] الثورة العربية –مكتب الثقافة والاعلام عدد: 8 ص58

هەمو حزبەكانی تری قەدەغە كرد تەنها حزب مایەوە[1128] ،دەلێ زۆر جاریش هەیە ئەو هەنگاوەبە دەستووری كراوە، ئەو حزبە تەنها یاساییەو تیكەلی حكومەت بوە (جیانەكراوەتەوە) باقی تر قەدەغەن بە یاسا ، لە مادەی (8)ی دەستوری سوریا -1973 بە فەرمی وەسفی حزبی بەعس بە (حزب القائد)دەكا ،دەقەكەی(حزب البعث العربي الاشتراكي هو الحزب القائد في المجتمع والدولة ويقود جبهة وطنية تقدمية تعمل على توحيد طاقات جماهير الشعب ووضعها في خدمة أهداف الأمة العربية)، دەستوری جزائیری 1963 بنیاتی كۆماریكی تاك حزبی (بە ناوی جبهه التحریر) كردوە وەك لە مادەی (22) وابەرجەستە بوە : (لا يجوز لأي كان أن يستعمل الحقوق و الحريات السالفة الذكر في المساس باستقلال الأمة و سلامة الأراضي الوطنية و الوحدة الوطنية و مؤسسات الجمهورية و مطامح الشعب الإشتراكية، ومبدأ وحدانية جبهة التحرير الوطني)، نمونەی (اتحاد الاشتراكی)میسریش تا1978 لەو شێوەیە بوە .

لە حزبە شیوعیەكانیش وولاتانی سۆشیالیستی بە جۆریكی تر لە دەستور تۆمار دەكرا ، بە ڕوونی لە دەستوری سۆڤیەتی 1977 ڕۆڵی حزبی شیوعی وەك سەركردە و پێشڕەو بە تاقی تەنها دەكا، لەگەڵ ڕای جیاو هەر جۆرە معارەزەیەك زۆر توند بوە ،دادگای مۆسكۆ لە 1936-1937 دژی ئەوانەی معارەزەی ستالین بوون بە ناوی پیلانگێڕی وبەفیتی حكومەتی ئەلمانیای نازی وهتلەر ،دژ بە ستالین ، هەریەكە لە ترۆتسكی وزینۆفیف وكامینیۆف وریكۆف وبۆخارین و..فەرمانی تیربارانیان بۆ دەرچوو .

**حزبی سەركردەو معارەزە :** حزبی سەركردە باوەڕی بە بوونی معارەزەی یاسایی نەبوەو نیە ،بەلكو یەكسەر بە كریگرتەو دەستی بێگانە هەژماردەكەن و سزای قورسیش بوە ، هەولیان داوە ئەو تێڕوانینە بگەیەنە تەنزیری ئایدیۆلۆجی و دۆزینەوەی كەلێن ونەرێنی سیستەمی دیموكراسی وسیستەمی معارەزەیی، بەگشتی جاران وتا ئیستاش هەندێ تیبینی لەسەر دیموكراسی و سەرخانەكانی هەیە ، لە ئیئتلاف و فرەحزبی و سیستەمی معارەزەیی ..، پێیان وایە پڕ لە قەیرانە ، ڕێگری لە جیبەجێ كردنی ئامانج وپەیامەكان دەكا ، ئەوەش پاساویكی تری هەندی لە سیستەمی

---

[1128] لقاموس السياسي –احمدعطية اللة ط3ص284 .

سیاسی ترەکە لەکاتی قەیران وقۆناغی گواستنەوە دەڵێن معارەزە زیان بەخشە ، جۆلیاس نایریری سەرۆکی تەنزانیا لە کتیبەکەی(حکم الحزب الواحد) دەڵێ لەکاتی قەیراندا دەبێ معارەزە یەکسەر بچیتە ژیر باری دەسەلات، لە جەنگە جیهانیەکان وولاتانی هەرە دیموکراسی ئەوروپا وای کردوە.

لە(5) بنەماکانی شیوعیەت سێیەمیان بەڕاشکاوانە واهاتوە (تاك حزبی و نەبوونی معارەزە)، لای هەندێ زانای رۆژئاوایش بەجۆرێك معارەزە ئەرێنی نیە ، لای هۆبز تاڕادەیەك ریگرتنە لە ئازادی کاری دەولەت ،نزیکە لەوەی لایەنگری لە حزبی سەرکردە بکا نەك ئۆپۆزیسۆنی ، پێی وانیە یاسا لە چوارچێوەی پەرلەمانی و معارەزەیی کردنی باش نیە ،بەلکو پێی وایە یاسا لەلایەن کەس ودەسەلاتی ڕەها دەربچێ باشە، دەڵێ: ئازادی بەگشتی بۆ مرۆڤ ودروستکراوی تر ئەوەیە کە هیچ کاریگەریەکی دەرەکی ڕێگر نەبێت،معارەزەی نەبیت[1129]، نمونەکەی نزیکە لە وەسفی (من دەولەتم ودەولەتیش من)،هەردوولاشیان نزیکە لە حزبی سەرکردە ،ئەگەر لویس ووتویەتی من دەولەتم لە حزبی سەرکردەش هەروا دەلێت ، (مۆسۆلینی-سەرۆکی فاشحزبی سەرکردەی فاشی ئیتالیا)دەلێت من وا لەمیکافیلی گەیشتوم کە (ئەمیر بریتیە لەدەولەت)[1130]،بە هەمواریکی تر دەلێ دەولەت حزبەو حزبیش ئەمنم ،بۆیە لە عیراقیش دەنوسرا (اذقال صدام قال العراق) ،

بە هەمان بۆچون پاپای کنیسەی قپتی پێی وایە دەشێ معارەزە بۆ سیستەمی سیاسی هەبێت بەلام ناشێت بۆ کنێسە هەبێت مادام لەسەر یەك گیانی کار دەکا، دەقەکەی واهاتوە (رأينا في حياتنا الكنيسة أن البعض باسم الدفاع عن (الديمقراطية)، ينادون بوجوب وجود (جبهة معارضة)، في الكنيسة.. فهل يتفق هذا مع روح الكنيسة ووحدتها، قد توجد (معارضة) في بعض التنظيمات السياسة أو التشريعية. أما الكنيسة فتقوم علي نظام (الروح الواحد)[1131].

---

[1129] توماس هوبز-اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص216، ص505 .

[1130] لە پیشەکی کتیبی نیقولا میکافیلی -(الامیر )—ص9

[1131] كتاب خبرات في الحياة للبابا شنودة الثالث ( المعارضة في الكنيسة) .

حزبى بەعس یاسای تایبەتی بۆ حزبە شیعیەکان دەرکردو سزای سیدارە بۆ هەرکەسیك ،بریاری (مجلس قیادة الثورة) 1980/3/31 دەقەکەی(استنادا الى احكام الفقرة أ من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ 1980/3/31 مايلي : كانت وقائع التحقيق والمحاكمات قداثبتت بأدلة قاطعة ان حزب الدعوة هو حزب عميل مرتبط بلاجنبى وخائن لتربة الوطن ولاهداف ومصالح الامة العربية ويسعى بكل الوسائل الى تقويض نظام حكم الشعب ومجابهة ثورة 17تموز مجابهة مسلحة ،لذا قرر مجلس قيادة الثورة تطبيق احكامالمادة 156من قانون العقوبات بحق المنتسبين الى حزب المذكور مباشرة او العاملين لتحقيق اهدافه العميلة تحت واجهات او مسميات اخرى ،ينفذهذا القرارعلى جرائم المرتكبة قبل صدوره،التى لم يصدرقرار احالتها على المحكمة المختصة —صدام حسين رئيس مجلس قيادة الثورة )[1132] .

ئەگەر ڕای هۆبزو هاوتاکانی ئەوە بێت ، یارمەتیدەری سیستەمی حزبی سەرکردە بووبن ،ئەوە ڕای تۆماس ئەکوینی وکانت ومۆنتیسیکۆو تادەگاتە فۆلتیرو رۆسۆ وگیزۆوهاوتاکانی لەبارەی سیستەمی سیاسی وجێبوونەوەی معارەزەو ناشرین کردنی سیستەمی حزبی سەرکردە پیچەوانە بوە ،گیزۆ کتیبیکی بەناوی(فی الوسائل الحكم والمعارضة السياسية فی حالة الراهنة لفرنسا) لەسالی 1821 نوسی، تیایدا رەوشەنبیری دەسەلاتی بەستەوە بە بوونی معارەزە و بینینی ڕۆلی فراوان لە سەر ئاستی چینە نوێکانی کۆمەلایەتیش[1133]، بەلام نمونەکانی پیشکەوتنی ئەوروپاو شکستی شیوعیەت و ناشرینی ئەو جۆرە ڕژیمانەو ڕژێمەکانی نازی وفاشی و بەعسی و تۆرانی و..زیاتر ڕووی ئاڕستەی تاك حزبی وحزبی سەرکردە ناشرین کرد .

ڕێگاکانی لەناوبردنی سیستەمی حزبی سەرکردە : ئەگەر لەڕووی تیۆریەوە هەندێ بۆچوونی لێکجیا هەبێت لەبارەی وەرچەرخاندنی سیستەمی حزبی سەرکردە بۆ سیستەمیکی دیموکراسی ،ئەوا لە ڕووی ئەزمزنیەوە کەم تر ئەو مشت ومڕە هەیە، لەدوای جەنگی جیهانی دوەم ودەست بەکاربوونی نەتەوە یەکگرتوەکان وتەقینەوەی جەنگی سارد وای کرد سیستەمی حزبی سەرکردە زۆربەی وولاتانی جیهانی

---

[1132] لاهوت السياسة ص109.

[1133] معجم المؤلفات السياسية ص675-

بگریتەوە لە ئاسیاو ئەفریقاو هەندێ وولاتی ئەمریکای لاتینیش،_زۆربەی ئەوانە بە ڕاپەڕین وشۆڕش ئەو سیستەمانە وەرگێڕدراون ، دوایش ئەو جۆرە حزبانە دادگاییان بۆ دانراوەو قەدەغە کراون ، لەوەوە تیۆرەکەی (سارتۆری)بەهێز دەکا کەلەکتیبی (الأحزاب وأنظمة الأحزاب) دەلێت (أن الانتقال من حكم الحزب الواحد إلى التعددية الحزبية لا يمكن أن يحدث من دون قطيعة، من دون انفجار، ما يضع حداً للسياق الأحادي ويفتتح الطريق نحو السياق التعددي) بەکوردیەکەی دەلێ سیستەمی تاك حزب وەرناچەرخێتە سیستەمی فرەیی بێتوندو تیژی وڕاپەڕین ، سەرچاوەکەشی لەوە دێت بوار بە هەندێ حزبی کارتۆنی دەدا بەلام بوار بە حزب وئۆپۆزیسۆنی ڕاستەقینە نادا ،بۆیە دەبێتە معارەزەی چەکداریو بەدەر لەدەولەت ، بەلام هەندێ ئەزمونی دەگمەن هەیە لەڕێی هەلبژاردنی دیموکراسیانە وەرچەرخا ،لەوانە بەرەی ساندنیستیا لە نیکاراگوا کە لە سالی 1979 دەسەلاتی وەرگرت بە شۆڕش دژ بە حوکمی سامۆزا ،تالەهەلبژاردنی 1990 دۆڕادی ،لە جزائر هەلبژاردن کرا لە 26\دیسمبر\1991 لە (%86)ی دەنگ بۆ بەرەی ئینقازی ئیسلامی هات، (جبهە التحریر)دۆڕاندی کەچی ئینقلابی کردەوەو هاتەوە دەسەلات وتا ئیستاش هەر سیستەمی حزبی سەرکردە پەیڕەو دەکا .

ئەزمونی حزبی سەرکردە لەکوردستان: لەکوردستانیش وەك جیهانی سێیەم زۆربەی ئەزمونەکانی جۆریك لە حزبی سەرکردە بوە ،ئەگەر چی ڕێی بە بوونی حزبی ترو جۆریك لە معارەزەو ڕەخنەش داوە ،دەتوانین بلێین لە سیستەمی وولاتانی عربی کەمیك باشتر بوە ،یەکەم حزبی فەرمی (تعالی وترقی کورد جمعیتلەر) لە 2/تشرین یەکەم/ 1908 دروست بوە،دوای لە سالی 1918 درێژەیان بە حزبێکی هاوشێوەی ئەو ناوە داوە ، یەکەم حزبە سەرکردایەتی شۆڕشی 1925ی کرد وشکستی هێنا، لەسالی 1927 نۆرەی (حزبی خۆیبونی- سەربەخۆبوون)دێت بۆ ڕابەرایەتی حکومەتی ئەرارات بە سەرکردایەتی (احسان پاشا)[1134]، دوای نۆرە (پ د ك)دێت لە دوای 1946 وەك حزبی سەرکردە ڕابەرایەتی حکومەتی کوردستانی لە مهاباد کرد ،دوایش شۆڕشی ئەیلول لە 1961 تا

---

[1134] بە پێی بەلگەنامەی بەریتانی (ڕاپۆرتی ئیلفینستۆن) یەکەم سەرۆکی خۆیبوون جەلادەت بەدرخان بووە .

1975 شکستی هێنا ، نۆرەی (ی ن ك) دێت له قۆناغی نوێی شۆڕش، لەوێ به ڕاشکاوانه تر دیزاینیکی حزبی سەرکردە داڕژرا (لەسەر ڕاڕەوی ماوتسی تۆنگ) بۆ سازدرابوو،کە بریتی بوو لە :

1- پێشڕەوێکی مارکسی (کۆمەڵە).

2- بەرەیەکی فراوانی چینەکان (یەکێتی)

3- سوپایەکی توندوتۆڵ (هێزی پێشمەرگە).

دوای ئەوەی بەتەنها نەیتوانی ڕابەرایەتیەکی سەرتاسەری بکا ،جاریکی تر (پ د ك)زیندوو بۆوە ئەویش به هەمان ئارستەی حزبی سەرکردە ،ئیتر له 1977ەوە دەتوانین بڵێین سیستەمیکی دەگمەنی (جووت)حزبی سەرکردە له کوردستان بەکارە تا نووسینی ئەو بابەتە.

<u>ئەو لیستەی خوارەوەناوی هەندێك لەو حزبانەن کە تا ئەو ساتەش به پێی سیستەمی حزبی سەرکردە ماون</u>

a. کۆماری چین حزبی شیوعی چینی 1949 تا ئیستا

b. کۆبا حزبی شیوعی 1959 تا ئیستا

1-کۆماری بیابانی رۆژئاوا بەرەی پۆلیساریۆ له 1975 ەوە تا ئیستا

2-ئەریتریا بەرەی میلی له پیناو دیموکراسی ودادله 1991ەوە تا ئیستا

3-کۆریای سەروو حزبی کریکارانی کۆریا له 1946 ەوە تا ئیستا

6-ڤیتنام حزبی شیوعی 1976 ەوە تا ئیستا

7- لاوس حزبی شۆڕشگێڕی لاوی له 1975 ەوە تا ئیستا

7-حزبی بەعسی سوریا له 1948 ەوە تاکو ئیستا

**<u>ئەو لیستەی خوارەوە هی پێشوو ترە: وەك خۆی له (موسوعه المعرفه)وەرگیراوە</u>**

**معظم دول الصحراء الكبرى الأفريقية بعد الاستقلال، عدا إرتريا التي تحولت في النهاية إلى نظام متعدد الأحزاب بحكم *القانون*"**

أنغولا (الحركة الشعبية لتحرير أنكولا–حزب العمل) 1975–1991

2– بنين (الحزب الثوري الشعبي في بنين) 1975–1990

3– -فولتا الجنوبية (التجمع الديمقراطي الأفيقي) 1960–196

4-بوروندي (الاتحاد من أجل التقدم الوطني) 1966–1992

5- الكاميرون (الاتحاد الوطني الكاميروني) 1966–1985، (الحركة الديمقراطية الشعبية الكاميرونية) 1985–1990

6- الرأس الأخضر (الحزب الأفريقي من أجل استقلال غينيا والرأس الأخضر) 1975–1981، (الحزب الأفريقي من أجل استقلال الرأس الأخضر) 1981–1990

7- جمهورية أفريقيا الوسطى (الحركة من أجل التطور الاجتماعي لأفريقيا السوداء) 1962–1980, (الاتحاد الديمقراطي لأفريقيا الوسطى) 1980–1981, (التجمع الديمقراطي لأفريقيا الوسطى) 1987–1991

8– تشاد (حزب التقدم الغاني) 1962–1973, (الحركة الوطنية من أجل الثورة الثقافية والاجتماعية) 1973–1975، (الاتحاد الوطني من أجل الاستقلال والثورة) 1984–1990

9– جزر القمر (الاتحاد الكاميروني من أجل التقدم) 1982–1990

جمهورية الكونغو (حزب العمل الكونغولي) 1969–1990

10– الكونغو–كينشاسا (الحركة الشعبية من أجل الثورة) 1970–1990

11- جيبوتي (التجمع الشعبي من أجل التقدم) 1977–1992

12- غينيا الإستوائية (حزب العمال الوطني المتحدة) 1970–1979، (الحزب الديمقراطي في غينيا الإستوائية) 1987–1991

13- إثيوبيا (حزب العمال الإثيوپين) 1984–1991

14– الغابون (الحزب الديمقراطي الگابوني) 1968–1990

15– غانا (حزب المؤتمر الشعبي) 1964–1966

16- غينيا (الحزب الديمقراطي الغيني – التجمع الديمقراطي الأفريقي) 1958–1984

17- غينيا–بيساو (الحزب الأفريقي من أجل استقلال غينيا والرأس الأخضر) 1974–1991

18- ساحل العاج (الحزب الديمقراطي العاجي – التجمع الديمقراطي الأفريقي) 1960–1990

19- كنيا (الاتحاد الوطني الأفريقي الكيني) 1982–1991

20- ليبريا (حزب ترو ويگ) 1878–1980

21- مدغشقر (الجبهة الوطنية من أجل الدفاع عن الثورة) 1976–1989

22– ملاوي (حزب التقدم المالاوي) 1964–1993

-23مالي (الاتحاد السوداني – التجمع الديمقراطي الأفريقي) 1960–1968، (الاتحاد 24–الديمقراطي من أجل الشعب الملاوي) 1976–1991

24- موريتانيا (حزب الشعب الموريتاني) 1961–1978

25- موزمبيق (FRELIMO) 1975–1990

26- النيجر (حزب التقدم النيجيري – التجمع الديمقراطي الأفريقي) 1960–1974، (الحركة الوطنية من أجل تقدم المجتمع) 1989–1991

27- رواندا (بارمِهوتو) 1965–1973, (الحركة الجمهورية الوطنية من أجل الديمقراطية والتنمية) 1975–1991

28– ساو تومه وپرنسيپه (الحركة من أجل تحرير ساو تومه وپرينسيپه/الحزب الديمقراطي الاجتماعي) 1975–1990

29- السنغال (الحزب الاشتراكي السنغالي) 1966–1974

30- سيشل (الجبهة التقدمية الشعبية السيشلية) 1977–1991

31- سيراليون (مؤتمر عموم الشعب) 1978–1991

32- الصومال (الحزب الاشتراكي الثوري الصومالي) 1976–1991

-33 السودان (الاتحاد الاشتراكي السوداني) 1971–1985, (حزب المؤتمر الوطني) 1989–2005

-33 تنزانيا (Chama Cha Mapinduzi) 1977–1992

قالب:Country data Tanganyika (الاتحاد الوطني الأفريقي في طنجانيقا) 1961–1977

34زانزبار (الحزب الأفرو–شيرازي) 1964–1977

-35 توكو (حزب الوحدة التوگولية) 1962–1963, (تجمع الشعب التوگولي) 1969–1991

-36 أوغندا (المؤتمر الشعبي الاوغندي) 1969–1971

-37 زامبيا (حزب الاستقلال الوطني المتحدة) 1972–1990

بعذ دول الشرق الأوسط وشمال أفريقيا"

38– الجزائر (جبهة التحرير الوطني) 1962–1989

-39 مصر (الوحدة الوطنية) 1956–1958 و1961–1962, (الاتحادج الاشتراكي العربي) 1962–1976

-40 إيران (حزب راستاخين) 1975–1978، (الحزب الجمهوري الإسلامي) 1981–1987

-41 العراق (الاتحاد الاشتراكي العربي العراقي) 1964–1968, (حزب البعث الاشتراكي بزعامة الجبهة التقدمية الوطنية) 1968–2003

-42 ليبيا (الاتحاد الاشتراكي العربي) 1971–1977

-43 يمن شمالى (المؤتمر الشعبي العام) 1982–1988

-44 اليمن الجنوبي (الحزب الاشتراكي اليمني) 1978–1990

-45 سوريا (حركة التحرير العربية) 1953–1954, (حزب البعث الاشتراكي العربي بزعامة الجبهة التقدمية الوطنية) 1963–2012

46- تونس (الدستور الجديد) 1963–1964, (الحزب الدستوري الاشتراكي) 1964–1981

47- تركيا (حزب الشعب الجمهوري) 1923–1946

48- مصر (الاتحاد القومي) 1958–1961

دول الحزب الواحد في شرق آسيا"

49- تركمنستان (الحزب الديمقراطي التركستاني) 1991–2013

دولة الحزب الواحدة في جنوب آسيا"

50- بنغلادش (Bangladesh Krishak Sramik Awami League) 1974–1975

دولة الحزب الواحدة في جنوب شرق آسيا"

51- بورما (تعرف حالياً باسم ميانمار) (حزب البرنامج الاشتراكي البورمي) 1964–1988

52- إندونسيا (الحزب الوطني الإندونيسي) 18 أغسطس 1945 – 1 سبتمبر 1945

53-الاتحاد السوفيتى السابق، حلف وارسو، ودول شيوعية أخرى"

54- أفغانستان (الحزب الديمقراطي الشعبي الأفغاني) 1978–1992

55- ألبانيا (حزب العمال الألباني) 1944–1991

56- بلغاريا (الحزب الشيوعي البلغاري بزعامة Fatherland Front) 1946–1990

57- كمبوديا (الحزب الشيوعي الكمبودي) 1975–1979، (حزب الشعب الثوري الكمبودي) 1979–1993

58- تشيكوسلوفاكيا (الحزب الشيوعي التشيكوسلوفاكيا بزعامة الجبهة الوطنية) 1948–1989

59- ألمانيا الشرقية (حزب الوحدة الاشتراكي الألماني بزعامة الجبهة الوطنية) 1949–1989

غرينادا (حركة جوال الجديدة) 1979–1983

60- المجر (حزب الشعب العامل المجري) 1948–1956، (حزب العمال الاشتراكي المجري) 1956–1989

61- منغوليا (حزب الشعب الثوري المنغولي) 1921–1990

62- فيتنام الشمالية (حزب العمال اليتنامي) 1945–1976

ﭘولندا (حزب العمال المتحدة الﭘولندي بزعامة Patriotic Movement for National Rebirth) 1948–1989

63- رومانيا (الحزب الشيوعي الروماني) 1947–1989

64- الاتحاد السوڤيتي (الحزب الشيوعي السوڤيتي) 1922–1991

65- يوغسلاڤيا (الحزب الشيوعي اليوغسلاڤي) 1945–1990

دول قومية أخرى"

66- النمسا (Fatherland's Front) 1934–1938

67- تايوان (كومويننتانك) 1928–1987

68- جمهورية الدومنيكان (الحزب الدمونيكاني) 1931–1961

69- ألمانيا النازية (الحزب النازي) 1933–1945

70- المجر (Arrow Cross Party) 1944–1945

71- إيطاليا (الحزب الفاشي الوطني) 1922–1943 و Italian Social Republic (الحزب الفاشي الجمهوري) 1943–1945

72- اليابان (Imperial Rule Assistance Association) 1940–1945

73- مانشوكو (Concordia Association) 1932–1945

74- النرويج (National Gathering) 1942–1945

باراغواي (حزب كلورادو) 1947–1962

75- البرتغال (الاتحاد الوطني) 1933–45، 1948–1974

76- رومانيا (National Renaissance Front) 1938–1940, ( National Legionary State) 1940–1941

77- سان مارينو (Sammarinese Fascist Party) 1926–1943، (الحزب الفاشي السوريناميي) 1944

78- سلوفاكيا (حزب الشعب السلوفاكي) 1939–1945

79- إسبانيا (الاتحاد الوطني الإسباني) 1923–1930, (الحركة الوطنية) 1939–1975

**(37)**

# ئازادی الحريه snedan Freedom

**ئەوانەش دەگرێتەوە( ئازادی ئامانجدار–(Freistaat –کۆماری، الحريه الموجهه ، کۆیله ، فیزیۆکراتی ،ستۆیلی ، لوکی،..)**

زاراوەیەکی کۆنەو بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤە، هەموو مرۆڤێك پێویستی پێ هەیە، پاپا شنۆدە دەڵێ دەولەمەندی لە ئازادیە نەك سامان ،تا ئەو ڕادە( دوبیران) ئازادی بەستۆتەوە بە بوون وبنەماکەی دیکارتی واگۆڕیە ئەمن ئازادم واتە ئەمن هەم، بۆیەش هەم پێناسی زۆرە وهەم هاوتاشی زۆرە ،لە زمانی کوردی شان بەشانی ئازادی زاراوەی سەربەستی و زاراوەی تری لۆکالی بوونی هەیە ،بە عربی (حريه)بە ئینگلیزی ( Freedom) ، (snedan) بە ڕووسی ( у свободы) ..، زۆری لە بارەوە نووسراوە،زۆربەی دروشمەکانی کۆن ونوێ ئازادی تێایە، ئەوەندە ڕای گشتی بۆ دروست کراوە جار وایە لە ژێر ئەو دروشمە تاوانیش کراوە ، وەك ڕووداوەکەی مدام رۆلان- یەکێ لە تێکۆشەرانی شۆڕشی فەرەنسی ، لە سەردەمی رۆپسبیر لەسێدارە درا، سەرکەوت بۆ سێدارە وتی: (ئەی ئازادی ئەو هەموو تاوانە بەناوی تۆوە دەکرێ).

یەکێ لە پێگە بنچینەییەکانی هەرئاینێکی ڕاستەقینە ئازادی بووە، زۆربەی ئایدیۆلۆجیە بەشەریەکانیش دان بەو مافەبنچینەیەی ئادەمیزاد دەهێنن بەتایبەتی جاڕنامەو یاسادەولیەکانی سەردەم ، لە سەردەمی کۆمەڵگەی ئیسلام هەموو ئەو کۆت و زنجیرانەی بەناوی ڕەش و سپی و عەرەب و عەجەم و کۆیلایەتی و ئافرەت چینایەتی.. هەڵتەکێنرا، بۆ یەکەم جار بنەمای (متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا )پەیڕەو کرا، هەتا دیل وکۆیلەی جەنگیش لە بەرامبەر فێرکردن و خوێندن ئازاد دەکران، تاڕادەیەکی زۆر ئازادی لە بەرامبەر کۆیلایەتی سەری هەڵداوە، لە قاموسە کۆنەکان کە باسی ئازادی کرابێ بەرامبەر کۆیلایەتی دانراوە ،لە ( تعریفاتی جرجانی)ئەومانایە سیاسی وکۆمەلایەتی ویاساییانەی ئیستا ناگرێتەوە،زیاتر بەلای رزگاری لە

کۆیلایەتی دەگرێتەوە[1135]، هەرچەندە دەشگۆترێ یەکەم جار ناوی ئازادی لە ریکەوتنێکی لاکشی سەردەمی ئۆرکاگینای سۆمەری هاتوە لەسالی 1878پ ز بوویتە بنەمای دەسەلات ، ئەوەی بە دلّنیایی ڕاستە زاراوەی (ئازادی )چ ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ لە تیکستە ئاینەکانی کۆن هاتوە ، تادەگاتە ئەو سەردەمەهەر نوێکراوەتەوە، ئیستاش کۆمەلیك یاسای نێودەولەتی بۆ داڕژوە ،بەلام لەهەناو وژینگەیەك هاتوە ڕەسەن نیە ،لەئەوروپا بەوە ووترا ئازادی کە لەژێردەستی کنیسەو قەشەو پاپا وئیمپراتۆر رزگاربێ ،بۆیە ئازادی و ئازادی لە ئاین خراپ تێکەل بوە،بۆیە ئەو کاریگەریە لەیاسای دەولی بەدی دەکرێ ،لە دوای ئەزمونی شیوعیەت وحزبەکانی سەرکردە بەدەگمەن نیە دەستوری هیچ وولاتیك نکولی لە ئازادی بکات ، بۆیەش پیناسیکی گەلێ زۆری هەیە ،هەندیکی هەلدەبژێرین :

پیناس : لەبەر فراوانی لەپیشدا پیناسە جۆربەجۆرەکانی وەردەگرین ، کە بەکورتیەکەی بریتیە لە: توانای کارێك کە دەیەوێ بیکا ، بەشیکی تر:کردنی مژاریك لە نیوان چەند مژاریك مانای ئازادیە ، بەشە توندەکەی دەلێن ئازادی بەمانای هەلتەکاندنی هەمو کۆت وبەندێك لەپیش مرۆڤ ئازادیە .
پیناسی فقهی : قواعد العدل والإحسان[1136].

پێناسی فلسفی:

+ اختيار الفعل عن روية مع استطاعة عدم اختياره أو اختيار ضده .

+ انعدام القيود .

+ قدرة المرء على فعل مايريد .

+ مەوسوعەی فلسفی ستانفۆرد: ئازادی نەبوونی زیانە بۆ خەلکی تر .

**پیناسی یاسایی:**

---

[1135] جرجانی -التعریفات ص52

[1136] الإسلام والحضارة الغربية ص29.

+ **ئازادی خەلك لە مژاريك لە مژارەكانی دياری كراو.**

**+** هەمو هاولاتيەك بتوانی معارەزەی دەسەلات بكا .

+ تمكين الأفراد من معارضة الحكومة فيما تختص فيه من المجالات للحيلولة دون تمادي الحكام وطغيانهم .

+ حرية التصرف للسلطان الحاكم المطلق .

پێناسی مافپەروەرانە:

+ حرية الناس في اختيار من تجب له الطاعة .

+ حرية الناس في ألا يحكموا بغير شخص منهم وقوانين ليست من صنعهم .

+ حقوق الإنسان في أن يكون حرا من القيود التي يراد فرضها عليه لان الحقوق ( وسيلة ) نفسها ليست الاحريات ( هدف ) معترف بها ومحمية بشكل ما .

**پيناسی دەستوريانە:**

**+** مژاريك لە كاركردن كە زيانی بۆ خەلكی تر نەبێت ، يان وەك ( قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية) دەلێ ڕای فەرهەنگە دەستوريەكان ئەوەيە ئەو ئازاديەی بەپێی ياسا سنوری بۆ **دەكيشرێ بۆ گشت**[1137].

+پيناسی هۆبز: ئازادی بەگشتی بۆ مرۆڤ ودروستكراوی تر ئەوەيە كە هيچ كاريگەريەكی دەرەكی ڕێگر نەبێت[1138].

---

[1137] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ص145

[1138] توماس هوبز-اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص216

+پیناسی (الإعلان الصادر لحقوق الإنسان في فرنسا عام 1789): ( قدرة الإنسان على إتيان أي عمل لايضر بالآخرين وان الحدود المفروضة على هذه الحرية لا يجوز فرضها الابالقانون ) .

+بۆچوونی وجودیانه ئەوەیە کە ئازادی و(بوون)ی پێکەوە بەستاوە ،پیناسیشی بریتیە لە هەلبژاردنیکی ئازادانە لە نیوان هەزاران ئیختیار[1139].

+ الموسوعه العربيه : ئازادی مانای هەلسان بەکاریك کە بتوانی دژەکەشی بکەیت [1140].

+ شۆبنهاوەر: ئازادی خوای میژوە[1141] .

+ معجم القرن 21 : ئازادی بریتیە لە هەلبژاردن لە نیوان چەندین ئیختیار[1142] .

+ د محمد عمارة : الحرية ضدالعبودية الحر ضد عبد[1143].

زیاتر لەو پێناسانەش ئەگەر لای هایدگەر بە ڕوانگە (وجودیەکەی)مانای توانای دۆزینەوەی بوونە وەك خۆی بێت ،لای هیگل هەلسان بەهەرکارێك بیئەوەی پالپشت بکاتە سەر هیزیکی دەرەکی لەخودی خۆی ،لای (کانت)یش وەك هیگلە بەلام دەلێ بە عاقلانە ئەوا هەندی فەیلەسوفیش دەلین ئازادی هەر پیناسی نیە لەوانە(یاسپیرز —مارسیل-لاڤیل-شۆبنهاور-هۆبز-هیۆم)..

## ئازادی لە بەلگەنامەکاندا:

ئارستەی ئەکادیمیای ئەو سەردەمە وایە زیاتر میژووی ئەوروپا بوویتە پێوەر بۆئەو چەمك وپیشـهاتە نوێیانە ،بۆیە یاسا ئاینیەکان یان یاساکانی حمورابی بە یەکەم هەنگاوی ئازادی نازانن بە تایبەتی ئەو بنەمازەردەشتیانە کەچەندە ئازادی تیّدایـە، بـە پێـی (موسـوعەلالاند ) بنـەماکانی( پرۆتـۆگراس

---

[1139] الموسوعه العربيه ج22 ص149 .

[1140] الموسوعة العربية ج8ص341

[1141] رةوشي فلسفى لقستدةى 21 ص208

[1142] معجم القرن 21 ص82

[1143] معركة المصطلحات ص97

)سەبارەت بە مرۆڤ ماناى سەرەتايەكى ئازادى بوە[1144]، بەشێكى تر بۆياساكانى سۆلۆن(سەدەى 6ى پ ز)ى ئەگريكى دەگێڕنەوە، ئەوەى ڕوونە 6 بنەما لە 48پ ز لە دادگاكانى رۆم تۆماركرابوون كـە تيايدا باس لە مافى سروشتى مرۆڤ دەكا .

لەسەر دەمى نوێ (بەڵگەنامەى ماگناكارتا)بە يەكەم بەلگەنامە هەژماردەكرێت كە جۆن سانتێر دەرى كرد لە 1215/6/15ز پێك هاتبوو لە 63 مادە ، ئەوە بە سەرەتايەكى ئازادى وديموكراسى ومافى مرۆڤى هاوچەرخ دەژمێرن،لەسالى 1687يشجيمسى يەكەم ياساى (ليبوردنى)جاڕدا لە نێوان ئاين ومەزهەبەكان[1145] ، چاكسازيە ئاينيەكانى مارتن لۆتەر(1483-1546) كەمێك چەمكى ئازادى خستە نێو فەزاى ئاينيش،،دواى بوە بەشيكى (نەريتى دەستورى)لەو وولاتە، ئەوەى ناوى نراوە (سكالاى ماف)كەلە 1628 توانرا لەلايەن پەرلەمانى بريتانيا هەندێ ئازادى لەلايەن (مەليك چارلز)بدرێ بەهاوولاتى، لەسالى 1688 -1689وبەهۆى ڕاپەڕين وشۆڕشى بريتانى گەورەترين بەلگەنامەى ئازادى ومافى مرۆڤ ڕاگەيەنرا ، لەسەر ئاستى ئەوروپاش پەيمان نامەى ويستيفاليا (WEST PHALIA)-1648ز سيستەميكى ئەوروپى هێنا كايەوە ، ئينجا بنەماكانى شۆڕشى ئەمريكى 1776 بڕگەى يەكەمى(إن الناس جميعًا خلقوا متساوين، وإن خالقهم حباهم بحقوق لايجوز الافتئات عليها، وإن من هذه الحقوق حق الحياة، والحرية، والسعي وراء السعادة) ، لە بنەماكانى شۆرشى فرنسى 1789 جاڕنامەى (**إعلان حقوق الإنسان والمواطن** – پێكهات بوو لە 17مادە لەلايەن (ئەنجومەنى نيشتمانى فرنسى) وەك جاڕنامە لە 26ئۆگستى 1789بەرجەستەى كرد، دواى لەسالى 1791ز لە دەستورى فرنساش چەسپا، دواى لەسالى 1863 ابراهام لانكۆلن ياساى قەدەغەى كۆيلايەتى دەركرد،...دواى ئەو جۆرە ئازاديە بوە بنەماى دەولەتى مۆديرن وزۆربەى كۆنگرەو ڕێكەوتننامە نێودەولەتيەكان ، لەدواى دروست بوونى نەتەوە يەكگرتوەكان ئازادى ومافى

---

[1144] موسوعةلالاندالفلسفية ج1 ص568

[1145] لة (قصة الحضارة –ويل ديورانت ص 10917 –عصر لويس الرابع عشر –إنجلترا – الثورة الجليلة – الملك الكاثوليكي) بەروارى دەركردنى ئەو ياسايەى بۆ رۆژى 1687/8/4 گێڕايتەوە .

مرۆڤ بوه مادەی بنچینەی میساق لە میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان چەندین مادە لەو بارەیەوە هەیە مادەی یەکی (مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان) ئینجا مادە 13 ومادە 55ومادە 62 ومادە68ومادە76..، لەسالی 1948 بەفەرمی جاڕنامەی مافی مرۆڤ دەرچوو ، هەردوو عهدی دەولی (مادەی9،6،3 ی عهدی مەدەنی وسیاسی) و(مادەی5،3،2ی عهدی ئابووری وکۆمەلایەتی ، ئینجا(إعلان منح الاستقلال للبلدان والشعوب المستعمرة: 1514 (د-15) المؤرخ في 14 كانون الأول/ديسمبر 1960) هترووەها (قرار الجمعيةالعامة رقم 3070 ).

دیباجەی زۆربەی بڕیارو ریکەوتنە نیودەولەتیەکان داکۆکی لەو مافە دەکاتەوە ،لەو دوایە ئازادی وبەمافی چارەنوس پێکوە بەستران. ئینجا (إعلان حقوق الإنسان والمواطن – 1789 )پیکهاتبوو لە 17 مادە ، ئینجا(إعلان بشأن حقوق الأشخاص المنتمين إلى أقليات قومية أوإثنية وإلى أقليات دينية ولغوية)کەلە 18 كانون الأول/ديسمبر 1992 - قرار الجمعية العامة للأمم المتحدة 135/47 ،لەو دواییەش (إعلان وبرنامج عمل فيينا الصادر عن المؤتمر الدولي لحقوق الإنسان المعقود في فينا خلال الفترة من 14 إلى 25 حزيران/يونيه 1993 ) .
لە پرۆتۆکۆلەکانی (حکماو صهیۆن- ژ:1) دەلێت ئیمەین یەکەم جار باسی ئازادیمان کردوە ،بەلام هەر لەو پرۆتۆکرلە بەجۆری جوداوبە لێلی باسی دەکا .

<u>**جۆرەکانی ئازادی**</u>: بریتین لە ئازادیەکانی تاك وکۆی مەدەنی وسیاسی وئاینی وفەرهەنگی و ، ئازادی بیروهزر،.. یەکەم جار رۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکا جۆرەکانی ئازادی کردە چوار بنەماو لە 6/ینایر/1941 لەشیوەی پەیامیك لە کۆنگریسی خویندەوە بریتین لە (1-ئازادی ڕا دەربڕین2- ئاینی 3- پیویستیەکانی 4-نەمانی ترس[1146]، یان وەك لە (القاموس السياسى) ئەو چوار بنەمایەی کردۆتە دوو تەوەر1- ئازادی( أ-دەربڕین ب– ئاینداری) ئاسایشی( أ-پێویستیەکان ب–

[1146] Encyclopædia Britannica-Article :Four Freedoms

ترس) [1147]. هەندێ جار لەپەنای گرنگی قۆناغێك یان جەنگ باس لە جۆرە ئازادیەكی دیاری كراو كراوە ،وەك جۆلیاس نایریری سەرۆكی تەنزانیالە كتیبەكەی(حكم الحزب الواحد) زیاتر جەخت لەو دۆخە سیاسیە دەكاو دەڵێ لەكاتی قەیراندا دەبێ ئازادی كەم بكرێتەوە معارەزەو ڕەخنە نەمینیت ، ماوتسی تۆنگیش لە بارەی (ئازادی ئامانجدار)تیۆرەكانی بەناوبانگە .

بەگشتی ئازادی زیانبەخش وسودبەخشیش جۆریكی ترە لە پۆلینی ئازادی كەلەدوایی باسی دەكەین .

لێرەوە ئازادی مانای قەدەغە شكاندن نیە ،مانای بێیاسایی نیە ،ئەو جۆرە ئازادیە ئازادی بێسەروبەری پێدەووترێت ،

ئازادی تاك زیاتر گرنگی پێدراوە ،كەلە فلسفەی لیبرالی بەرجەستە دەبێت ،كەمتر ڕەچاوی ئازادی میلەتان و كۆمەلە كۆمەلایەتیەكانی تر كراوە،تا لەو دواییە نەتەوە یەكگرتوەكان دروست بوو تیایدا مافی چارەنوسی میلەتان وەك بەشێك لە ئازادی ومافی مرۆڤ هەژماركرا ، بۆچوونی (جۆن ستیرات میل )لەكتیبەكەی(الحریە-1895) بناغەی ئازادیە جۆربەجۆرەكانی لەچوارچێوەی حكومەتی مەدەنی دارشتوە بۆ بریتانیا ، كەببێتە نمونە بۆ جیهانیش .

بەگشتی دووجۆر ئازادی پۆلین كراوە لەو سەردەمە ئازادی عەبەسی وئازادی ریكخراوو ئامانجدار،لەو سۆنگەشەوە دۆمەینی ئازادی دەدۆزرێتەوە كە لەخواروو بەدرێژی ترباسیان دەكەین .

فلسفەی ئازادی: بەپێی ئەو نهێنیانەی پێش دەست پێكردنی میژوو وادێتە بەرچاو كە مرۆڤ بە هۆی ئازادیەوە سزا دراوە ، سەربردەی ئەو سزایە لە تەورات وئینجیل و قورئان ودەقە كۆنەكانی تریش هاتوە كە چۆن(ح ئادەم) بەو هۆیە لەگەل هاوسەرەكەی سزا درا ، وەك جیمس فریزەر دەڵێ ئەوە یەكەم تەقەلای مرۆڤ بوو لە (مسەیەر)یەوە بۆ (موخەیەری)یەوە، لە نەبوونی ئازادی بۆ بەدەست هێنانی ئازادی[1148]، ڕەنگە ئەوە لایەنی رۆمانسی میژووی ئازادی بێت ،تیۆڕوانینە هەلەكە لەوە دێت وادەزانرێت ئازادی معارەزەی شەیتان بۆ هەمو بوونەوەر بێت ،لە (قاموس الخرافات والاساطیر)دەلێت

---

[1147] احمدعطیة اللة –(القاموس السیاسي)ط3ص458

[1148] جیمس فریزر- الفولكلور فی العهد القدیم- ت: نبیله إبراهیم ج1 ص 47-72.

شەيتان دەسەلاتی لەزەوی وئاسمانەکان هەیەو معارەزەیە لەو پانتاییە فراوانە[1149]..کەچی دەسەلاتی شەیتان ئەوەندە فراوان نیە ،لە بوونەوەر نیە ،لەگەردوون نیە،لە سروشتیش نیە ..تەنها لەسەر زەویە لەویش لەناو مرۆڤ لەویش تەنها لەو پانتاییەی کە ئازادی لێدراوەتە مرۆڤ ، کەواتە بە پیچەوانەوە میژووی ڕیکخستن ویاسا لێرە دەست پیدەکا ، ڕێگرتن لە یاخی بوون ، ڕێگرتن بێت لە فەوزا ،بەشیکی تری ئاینی دەلێن ئەوە یەکەم ئازادی خوا بە مرۆڤی دا بوە یاخی وکارەسات ..،بۆیە ئازاد نەبین باشە پالپشت دەکەنە سەر ئایەتیکی قورئانی(فكان انسان ظلوما جهولا) .

لە کاتێکا لیکدانەوەی دروست ئەوەیە کە ئادەمیزاد ئەندازەیەك لە ئازادی پێدراوە لە سروشت وبوونەوەریکی تر ئازادی پێنەدراو، واتە مخەیەریك لە نێوان مسەیەرەکان ، سروشت بەهەموو ناوەڕۆکیەوە (ئاو و هەوا و شاخ و دارستان تادەگاتە ئەلیکترۆن) بەمسەیەری هاتوون، بەپێی ئەو یاسا سروشتیانە دەجولێن نەك ئیرادەی خۆیان ،بۆیە ئەوانە هەلەیان نیە(مەعسومن)پەیامیان پێویست نیە یاسایان پێویستە ، جموجۆلّیان بریتیە لە بەرجەستەو خوردکردنەوەی ئەو ئیمکانیەت و بەرنامەیەی بۆیان دانراوە ، واتە بۆ جیوە نیە ببێتە نەوت، بۆ ئاسن نیە ببێتە زێر ، هەرچی ئادەمیزادە ئەوا عەقلی پێ بەخشراوە، ویست و ئیرادەی خۆی هەیە، دەتوانێ لەنێوان کۆمەلّێکی زۆری ئەگەر (ئیختیار) بۆخۆی چی چاکە هەلّبژێرێ و بیکات..ئەوەیە فلسفەی(انی جاعل فی الأرض خلیفة)، لەوەوە ئادەمیزاد لە باقی گیان لەبەرانی تر جیا دەکاتەوە کە ئەوان گیان لەبەرو هۆشمەندن بەلام عەقلداری (مکتسب) نین،ناتوانین والە شێرو پلنگ بکەین ئازادی بدەنە نیچیرەکانیان ، مار ودوپشك دەبێ پێوە بدەن، ئەوە پەیامیەتی وپەیامی تری ناوێو پیغمبەرانی ناوێ هەروەك هەندێك لێی بەهەلەداچووینە ،( وزعم ابن حائط أن في كل خلق من الخلائق أنبياء حتى في الحمر والطير والبراغيث..)[1150] ،تەنها بۆ ئادەمیزاد پیویستە،هۆکارەکەشی ئەوەیە چونکە ئادەمیزاد ئازادیەکی خواپێداوی هەیە،هەموشیان نازانن بە دروستی ئازادیەکەی بە ستاندەرانە هەلبژێری ، لێلرەدا

---

[1149] قاموس الخرافات والاساگیر-ص68

[1150] بن طاهر المقدسی —البدء والتاريخ ص150

پێغمبەروپەیامی پێویستە ،پەیامی پێغمبەران وعەقلیش بۆ ڕێنمایی کردنیەتی تا ئازادی نەبێتە زیان وفەوزا .

له ئادەمیزاد (جگە لە جوڵە بایلۆژیەکانی نێو لەش) ئۆتۆماتیکی نیە، میکانیکیانە پەیڕەوی (هۆ) و (ئەنجام)ی ناچاری ناکا وەك زۆر لە مەزهەبی ئاینی وفلسفی وای بۆچوون،تەنانەت مارکسیەتیش بە شێوەیەك دێتە سەر تیۆری جەبری دەڵێ مرۆڤ ئازاد نیە بەلکودیلی بازاڕو بژێویەکەیەتی بۆیەش حەتمی مێژوویی پەیڕەو دەکا[1151]،کەچی وانیە ئازادە(مخەیەرە) ، دۆزینەوەی دۆمەینی ئازادیەکەی ووردەکاری دەوێ ،چونکە ناکرێ وناشێ باس لە ئازادی ڕەها بکرێت ،هەرخودی ئازادیەکانی تر دەبتە کۆت وبەند ودیاری کردنی ئەو دۆمەینە ، یاسای سروشتی بوار بەبەشەکانی سروشت نادات ئازادیان هەبێ،بەلکو (مسەیەرن) چونکە عەقلیان پێ نەدراوە،هەرچی ئادەمیزادە لەو پەیامە ئازادی وئیختیاریان بۆ بەجێ هیشتراوە بە ئەندازەی ئەو عەقلەی پێیدراوە،هەرچی باقی گیاندارانی تریشە دووبارە ئازادیەکانیان بەو ئەندازەیەی ئەو هۆشیاری وعەقلیەیە پێیان دراوە،هەر بە پێی ئەو کەمە عەقل وئازادیەیە لیپێچینەوەیان لەگەل دەکرێ ، زەمینەی(لە ئاسمان وزەوی) بۆ سازاوە ویاساکانی سروشتیشی بۆ کەوتۆتە کار،ئینجائازادی لەو مەودا تەسکە پێدراوە،کە ئامانجیکیش بهێنیتە دی ئەویش شارستانیە ،لێرەوە هەلەیەکی زەقی فلسفەی مادی لەبارەی ئازادی ئادەمیزاد دەردەکەوێ ،ئەوان دەلێن جموجۆڵ و ویستی ئادەمیزاد بەبەشێك لە سروشت و پۆلێن دەکەن، لەلایەن زۆربەی فەیلەسوفانی وەك هۆڵباخ و مارکس و هکسلی وسلامە موسا..دەڵێن ئادەمیزادبریتیە لەسێ ڕەهەند (گۆشت و خوێن و ئێسك)[1152] ، بەگشتی بۆشنسکی دەلێت مادیەکان پێیان وایەمرۆڤ بە پێکهاتە و ئارەزووچارەنوسی بەشێکە لە سروشت...[1153]، کەچی ئەو تێڕوانینە تەواو ڕاست نیە، ئەگەر وابێت ئادەمیزاد هیچ جۆرە ئازادیەکی نیە ،چونکە سروشت ئازاد نیەو مسەیەرە ،ڕاستیەکە ئەو بەشەی مرۆڤایەتی (لایەنی جەستەییەکەی)بەشێکە لە سروشت ئەوا یاساکانی سروشتی بەسەر پەیڕەو دەبێ

---

[1151] لە هەموان ڕوون تر لە ( ص257 بؤس الفلسفة–كارل ماركس) باس لەو جۆرە جەبریە دەکا

[1152] موسوعە الفلسفيە ص291

[1153] بوشنسكي – الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص69

وئازاد نیە،بەشەكەی تری عەقلانی —نامادی ئەوا بەیاسای تایبەتی جیا لە سروشت كاردەكا ،لەوێ ئازادیەك بە ئادەمیزاد دراوە ، مەرج نیە یاساكانی سروشت هەمان یاساكانی كۆمەلایەتی بن ،لێرەوە ئازادیەكە دیاری دەكرێت ، هەر بەنمونە یاسای (كار وكاردانەوە) كە یاسایەكی زۆر گشتگیری سروشتیە، كەچی لەناو جموجۆڵی ئادەمیزاد بەتاك و بە كۆمەڵگە پەیرەو نابێ، بە دیقەت وایە : بۆهەر كارێك لەناو كۆمەڵگە كاردانەوەی هەیە بەڵام مەرج نیە (بڕی كاردانەوە) یەكسان بێ بە بڕی (كار)، مەرجیش نیە لەهەمان كاتدا ئەو كاردانەوەی هەبێ، هەر لە جوڵەكانی (میكانیكی، جیۆلۆجی، فیزیایی، كیمیایی، زیندەكی، بایلۆژی، كۆمەڵایەتی، فیكری)[1154]،هەردوو سیستەمی دوایی تایبەتە بە مرۆڤ جیایە لەگەل سیستەمەكانی تر، بەڕوونی دەردەكەوێ بەهۆی (جولانی فیكری یان فاكتەری عەقلی) جولە و كاردانەوە و سیفەتی ناوەكی كۆمەڵگە و ئادەمیزاد جیا دەبێت لەگەڵ سروشت، جیایەكەی بریتیە ڕێك دۆمەینی ئازادی ، هەر لەوەش پانتایی مێژوو دروست دەبێت، ماناشی وایە ئازادی وژیان بەو پانتاییە ئۆرڤانیكیە پەیوەستن بەیەك .

ڕای مەدرەسەكان : ئازادی لەو سەردەمە بوویتە جێی شانازی تا ڕادەی مزایەدە ،دەتوانین بڵێین (ئیستا) هەمولایەك كۆكن لەبارەی پانتایەكی فراوانی ئازادی ،بەلام لەبارەی چۆنیەتی وسنوری وپەیوەندیەكانی و زۆر لای تری ناكۆكن و مەدرەسەكان دابەش دەبن ، ئەوروپاو مەدرەسەی لیبرالیزم -لیبرال دیمكراسی خۆی بەخاوەنی شەرعی ئازادی دەزانێ ، هەرخودی لیبرالی (Liberaly)بەمانای ئازادی دێت ،ئەویش بەخۆی هەموو ئەو تەوژمە فكری و فلسفیانەی نزیك لەخۆی وە (وجودیەكان، نەفعیەكان،پراگماتیكەكان ، رووكەشیەكان...) ئەوانە بە ناهاوسەنگی ئازادی بێ سنوور دەدەنە تاك بەرامبەر كۆمەڵ، بەلام گەلێ جار سنوریكی ڕوون لەنێوان ئازادی پۆزەتیڤ ونیگەتیڤ نەكراوە ،هەریەكە لەكرۆبۆتكین و برۆدۆن وفۆرۆ پێیان وابوو(ئەمریكی ئازادی رەها بۆ هەر تاكیك دادگەری دروست دەبیت)[1155]،

---

[1154] لەلایەن فلسفەی ماركسیەوە دان بەبوونی جولانی فكری داناهینن دەلین تەنها بریتیە لە ڕەنگدانەوەی واقیع.

[1155] القاموس السیاسي —احمدعطیة الله ط3 ص177 ، ص890

تاراد‌ه‌یه‌ك به‌شه‌ گرنگه‌كه‌ی وجودیش ئه‌و بۆچوونه‌یان هه‌یه‌، له‌و دۆخانه‌ ده‌بێته‌ ده‌رد ، كۆمه‌ڵێك سه‌ره‌نجامی سه‌لبی زۆر ترسناكی لێ ده‌كه‌وێته‌وه‌:

1- ده‌بێته‌ هۆی ته‌نگ كردنه‌وه‌ی ئازادی خه‌ڵكی تر.

2- تێك چوونی رێكخستنی كۆمه‌ڵایه‌تی.

3- هه‌روه‌ك دروست بوونی مه‌ودای ئازادی جیاجیاش ئاواش موڵكیه‌ت و داهاتی جیاجیا پێویسته‌،بۆیه‌ روجیه‌ غارودی ده‌ڵێ ئازادی و بازاری ئازاد مانای به‌ ئازادی هه‌ڵوشینی هه‌ژار له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌مه‌ند [1156].

4- ئه‌نجامی ئه‌و بازاڕه‌ هه‌ژاری زۆر و ده‌وڵه‌مه‌ندی زۆر په‌یدا ده‌كات له‌ یه‌ك كۆمه‌ڵگه‌ و له‌ یه‌ك وڵات و له‌یه‌ك شار ته‌نانه‌ت له‌یه‌ك خێزانیش، بۆیه‌ جاروایه‌ ده‌گۆترێ ئازادی سیسته‌می سه‌رمایه‌داری ڕووكه‌شه‌ . له‌سه‌ر ئه‌و بنچینه‌ محمد باقر الصدر ده‌ڵێ: له‌ سه‌رمایه‌داری به‌سه‌ربه‌ستی ده‌ست پی ده‌كات به‌ به‌ندایه‌تی هه‌موو لایه‌ك كۆتایی دێت ، كه‌چی به‌ندایه‌تی خودا به‌ به‌ندایه‌تی ده‌ست پێ ده‌كات به‌سه‌ربه‌ستی كۆتایی دێت[1157].

5- ئه‌وئازادیه‌ی سه‌رمایه‌داری زیاتر بۆ چینی برجوازیه‌ وه‌ك ماركس له‌(فی مسألەالیهودیه) وا ده‌ڵێت ، له‌ ئاماری 1998ی نێونه‌ته‌وه‌یی ده‌ركه‌وت دوای له‌ (كۆنگره‌ی زه‌مین)یش له‌ جوهانسبرك دووپات كرایه‌وه‌، (خه‌ڵكی سه‌روو)* له‌ 20٪ی دانیشتوانی جیهان پێك دێنن كه‌چی له‌ 86٪ی داهاته‌كان ده‌خۆن، (خه‌ڵكی خوارووش) له‌80٪ دانیشتوانن كه‌چی له‌ 14٪ ده‌خۆن، به‌پێی ئامارێكی (رۆجیه‌ گارۆدی- له‌ كتێبی پێشوو) هه‌ریه‌ك ملیۆنێری ئه‌مریكی بایی50 ماڵی ئه‌مریكی سامانداره‌، له‌ كوردستانی خۆشمان نه‌فه‌ر هه‌یه‌ داهاته‌كه‌ی یان فه‌رمانبه‌ری حزبی هه‌یه‌ مووچه‌كه‌ی (50) هێنده‌ی فه‌رمانبه‌رێكی تره‌.

---

[1156] روجیه گارودی- امریکا طلیعة الأنهیار ص184 .

[1157] محمد باقر الصدر -الإنسان والمشكلة الإجتماعیة ص86

* مه‌به‌ست له‌ خه‌لكی سه‌روو ئه‌مریكاو وولاتانی ئوروبای روزئاوا ده‌گریته‌وه

6- دەبێتە هۆی کۆمەڵێك سەرەنجامی تری قەدەغەکراو کە بناغە گرنگەکانی کۆمەڵ هەڵدەتەکێنێت وەك ئازادی جنس، ئازادی هەڵسوکەوت، ئازادی...

ئەو جۆرە ئازادی بێ سنورەش دەردێکی تر و زیادەڕەویە سەرچاوەی مەینەتی و داگیرکاری و چەوساندنەوەو ئیمپریالیزمی تا دەگەنە پیس کردنی ژینگە و,,, هتد دەبێت، لەبیریشمان نەچێ دژایەتی ئازادی لای رۆژهەلاتی شیوعیەت ئاشکراترە،لەبارەی رۆژئاواو سیستەمی ئیستعماری لیلیەك هەیەلەژێر پەردەی ئازادی سیستەمی ئیستعماری پاساوی پێدەدرێ ،هەرچەندە راینال ودیدرو لە بەشی (تاريخ الهندين)* دەلێن ئیستعمارو کۆیلایەتی شێوەی هەرە ناشرینی دزینی ئازادیە لە مێژوودا ، ..ئەوەی سەروو تێڕوانین وسەرەنجامەکانی مەدرەسەی لیبرالی و سیستەمی رۆژئاوایی بوو ،هەرچی لە شیوعیەتی ڕاستەقینەدایە دیکتاتۆری (پرۆلیتاریا) وحتمیە تاریخیە..ئازادی بۆ ئادەمیزاد نایەلێتەوە نە لە بیرکردنەوەو تێفکرین نە لە چالاکی ئابووری نە لە چالاکی سیاسی و ئایینی و ئایدیۆلۆژی، شێوە جەبری و مسەیەریەکە بەرەو کۆمەڵگای شیوعیەت،لە باشترین دۆخیدا ناویان ناوە ئازادی ڕاپێچکراو، (الحريه الموجهه) ، بەو شێوەیە ئادەمیزاد لە شیوعیەتدا لە هەموو لایەك بە کۆت و زنجیر دەبەسترێتەوە، هەروەك لە واقیعیشدا لە سیستەمی دەسەڵاتی ولاّتانی سۆشیالیزمی بینرا, زیاتریش لە شۆڕشی رەوشەنبیری چین، ئەلبانیا، کەمبۆدیا،.. هەتا زانای وەك (ئەندرێ ساخارۆف)ئازادی وا لیسەنرابۆوە لە ئاوەدانی دوور خرابۆوە بە تۆومەتی بێ عەقڵی، لەسەر ئەو بنچینە مارکس ئامۆژگاری دژ بە ئازادی وئاشتی دەدا ،دەڵێ ئیوە شۆڕشگێڕ وتوند بن ، هەموو(ئاشتی)یەکی لە ژێرکۆمەڵگەیەکی چینایەتی ڕەت کردۆتەوە و بە (بەنج کردنی) لەقەڵەم داوە،بەو هۆیەشەوە ئازادیشی بۆ بورجوازی ڕەت کردۆتەوە،دەشلێ ئاشتی لە نیوان سەرمایەداری برۆلیتاریانیە،ئیتر هەردەم لەگەڵ گۆڕین و جۆش و خرۆشاندن و و نەوەستانن نەك گۆڕان وچاکسازی بە ئازادی, ئەنجلس کتیبیکی هەیە بەناوی (دور العنف فی التاريخ) لایەنی واقعیەکەی لەوەی پێشوو

---

* - L’Ablé Raynal : Histoire philosophique et politique des établissements et du commerce des Européens dans les deux Indes وقد أعتبر هذا الكتاب، الذي طبع عدة مرات وبلغات عديدة، إنجيلا للمعادين للاستعمار، وفيه نقرأ مثلا ، "لم يسبق للنوع البشري بصفة عامة ولشعوب أوروبا بصفة خاصة أن عرفوا حدثا بمثل تلك الأهمية من الفعل الاستعمار، لأن الاستعمار جاء نتيجة الرغبة في الاغتناء وصَاحَبَهُ دائما العنف، فإنه لا يمكنه أن يُحَضّر أحدا".

چاتر نیە، مێژووی 70 ساڵەی شیوعیەت سەرباری جەنگ و کوشتار و تۆقاندنی جیهان، ئەوا ڕەوشەنبیر و نەیاران و هەتا هاوڕێیانی تیرۆر و تۆقاندن ، (لینین) ڕوون تر لەنوسینێکی (بم نبدأ) (نحن مبدئیا لم ننکر الارهاب یوما ولیس في وسعنا أن ننکره. فهو عمل من العمال العسکریة یمکنه أن یکون صالحا تماما وحتی ضروریا في لحظة معینة من القتال)[1158]، ئەویش بە توندی ئازادی ڕەت دەکاتەوە، بەشیکی تر توندتر لە مارکس زۆر دژی ئازادی بوون پێیان دەووترا (ئەنارکی –فوضوی)، لە مارکس زیاتر دژی بوونی دەولەت ومولکیەت وئازادی و دیموکراسیش بوون ،دژی ئاینیش بوو ،باکۆنین بە (ئەنارکی –فوضوی)هەژماردەکری زۆر دژی بوونی دەولەت ومولکیەت و دژی سیستەمی دیموکراسیش بوون، لایەنگری تیرۆر وخوین ڕشتن بوو لە پیناو هینانەدی سۆشیالیستی، باوەڕی بە ئازادی نەبوە،خاوەنی دروشمی (تحطیم کل ماهو واقع خیر) ، زۆر دژی ئاین بوو وەك لەکتیبی (الله والدوله ) گوزارشی کردوە ، بەشیکی زۆر پێیان وابوە گەورەترین ڕێگری لە پیش ئازادی ئاینە ، (پاوەر) دەڵێت بۆ ئەوەی ئازادی سیاسی بێتە دی نەك هەر ئاین دوور بخرێتەوە بەلکو دەبێ ئیمتیازی ئاینیش قەلاچۆ بکریت کە لەلایەن دام ودەزگای ئاینی بەرپا دەکرێت[1159] ، بەو شێوەیە ئازادی وعەلمانی ودیموکراسی وعەقلانیەت وکۆماری و سەردەم پیکدەبەستن، دەلێن دەسەلاتی ئاینی بەرەو دیکتاتۆری ودژە ئازادیە مادام خۆی بە پابەندی ئاینی وخواوەندی دەزانی نەك کۆمەلایەتی، وەك لە (Amodern Dictionary)دەلێ دەسەلاتی ڕەها ئازادیەکی ڕەهای بەخۆداوە پابەند نابێ بە یاساو دەستورو لە سیستەمی دیکتاتۆریەکانیش توند ترە[1160] ،دەلێن ئەوە چارەنوسی دەسەلاتی ئاینیە بە پالپشت بە( ڕێسای ڕۆبیرت مایکل –القانون الحدیدی للاولیکارکیە– iron law of oligarchy) کە دەلێ دەسەلاتی هەمیشەیی (بێدەست گۆڕی) دەبتە هۆی وەرچەرخان لە میلەتەوە بۆزۆرایەتی ، لەوێش بۆ کەمایەتی، لە کەمایەتی بۆ چەند کەسێك،[1161]،ئیتر تراجیدیای نەبوونی ئازادی سیاسی وکۆمەلایەتی وجۆرەکانی تر دەست پێدەکات .

---

[1158] لینین – بم نبدأ -کتب في أیار (مایو) 1901 في جریدة «الیسکرا»، العدد 4

[1159] باور–مسالة الیهودیة– ص8

[1160] -p19 Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts

[1161] الموسوعة المیسرة للمصطلحات السیاسیة–جزء(ق) ص32

لەکاتێکابەشیکی گەورەی زاناو بیریاران پێیان وایە لە ئاینی راستەقینەدا ئازادی بە ستاندەر دانراوە،وارێکخراوە گونجاوە لەگەل ڕسکانی مرۆڤ، قوول دەبێتەوە بۆ بناغە گەردوونیەکانی ، لە قورئاندا کە دەلیٚ (انی جاعل فی الارض خلیفة) ئازادیەکی پێدراوە بۆ دروست بوونی دەسەلاتێك ، ئەگەر ئەو دەسەڵاتەی ئادەمیزاد بۆ هەتا هەتایە پیٚ ببەخشیایە ئەوا دەگەیشتە پلەی (شریك) لەو بوونەوەرە ،بەڵام هەم بۆ تەمەنی ئادەمیزاد و هەم بۆ تەمەنی کۆمەڵگە دیاریکراوە، لەهەمان کاتدا دەسەڵاتە پێدراوەکەش دیاریکراوە بۆیە وەسفی (بەندە-عبد) ی بۆ دەسازیٚ نەك (شریك)،(محمدباقر سەدر) دەلێت: لە سەرمایەداری بەسەربەستی دەست پی دەکات بە بەندایەتی هەموو لایەك کۆتایی دێت ، کەچی بەندایەتی خودا بە بەندایەتی دەست پیٚ دەکات بەسەربەستی کۆتایی دێت[1162]،لە ڕستیدا هاوکیشەیەك هەیە لەو ئەکزیۆمە دەست پێدەکات ئەویش ئەوەیە مرۆڤ لەو بوونەوەرە تەواو سەربەست نیە ،یاساکانی سروشت وکۆمەلگەو دام ودەزگاکان وزۆرلای تر دەبنە کۆت وبەندی ئاسایی بەسەر هەر تاکێك بۆیە رۆسۆ لە (فی عقدالاجتماعی)دەلێت مرۆڤ وادەزانی ئازادە بەلام لە چەندین لاوە کۆت وبەند کراوە،تەنانەت پرۆدۆن پێی وایە پەیوەندی حاکم بەمەحکوم لە دەولەتیش بریتیە لە(حکم الانسان للانسان هو عبودیە)،ئەرستۆش لەکۆنەوە لەکتیبی(السیاسە)ووتویەتی هیچ کەسێك ئازادنابیت تەواو لەحکومەتا ،بەو شێوەیە نائازادی مرۆڤ هەیە،هاوکیشەکە لێرە دەست پێدەکات، لە دۆخی کۆیلایەتی : تا مرۆڤ کۆیلەی دەزگایەکی فراوان ترو گەورەتر بێت ئازادی زیاترە ،پیچەوانەشی تا ئەو دەزگایە بچوك ترو بێدەسەلات تربێت ئازادی کەم ترە ،لەوەوە کەمترین ئازادی کۆیلە بوونی مرۆڤە بۆ مرۆڤ کە کەمترین دەسەلاتە،زۆرترین ئازادیش کۆیلە بوونی مرۆڤ بۆ خودایە کەفراوانترین دەسەلاتی هەیە ، ئیتر ئازادی لەو نێوانە دابەش دەبێت ،ئازادی لەدەولەت زیاتر دەبێت نەك لە عەشیرەتیك ،ئازادی لە حکومەتیکی جیهانی زیاترە وەك لە حکومەتیکی نیشتمانی ،ئازادی لەهاوولاتی بوونی گەردوونی لەهەموان زیاترە کە مانای (عەبدایەتی خودا)دەبەخشێت ،لەو سۆنگەوە

---

[1162] محمد باقر الصدر -الإنسان والمشكلة الإجتماعية ص86

ڕایەکی (ئەمانۆیل کانت)هەیە نزیکە لەوەو دەڵێت ئازادی ڕاستەقینە ئەو کاتە دێتەدی کە کەس یەردەستی کەسێك نەبێت ، هەمولایەك یەکسان بن بۆ یەك یاسا[1163] .

لێرەوە لەگەڵ بیری دیزم و باقی عەلمانی میان ڕەویش لیك جیا دەبیتەوە کەوا دەزانن دەسەلاتی مرۆڤ زۆرە تا ڕادەی شریکی وئەو دەسەلاتەی خواش بە مرۆڤی داوە لەدەسەلاتی خوای کەم کردۆتەوە ،هەر لێرەوەش بناغە فەلسەفیەکانی هاتنی پێغەمبەران بۆ کۆمەڵگە ڕوون دەبێتەوە، تێڕوانینی ئاینی وەك شیوعیەت نیە هیچ ئازادی نەبێت و نە وەك لیبرالی رۆژئاوایشە کە بیَ سنور بێت، وا دەگۆتریَ لە لیبرالیدا ئازادی زیادی تاك لەسەر حیسابی ئازادی کۆیە ،لە سۆشیالیستیش ئازادی کۆلەسەر حیسابی ئازادی تاکە ،لەجیهانی سێیەم ئازادی هەردوولا لەخزمەت سەرۆکە،ئازادیەك پێویستە ڕێك گونجاو لەگەڵ سروشتە بنچینەکانی ئادەمیزاد ،مانای ئەوەش نیە ئەو تێڕوانینەیان لەنێوان ئەو دووسیستەمە (لیبرالی وشیوعیەت)داڕژرا بێت ، بەلکو لەسەروو دیاری کرا وەك مەولەتی گەردوونی وخوایی، ئینجا مرۆڤ بە ئازادی میژوو دروست دەکا کەچی لە تێکڕادا جۆرێك لە یاساو قاوغداری بۆ گەشەی میژوو دروست دەبیَ وەك (مەندل) هەستی پیکرد،ئۆتۆماتیکیانە سنور دیاری دەکا ، ئەو ئازادیە عادەتەن پێی دەووتریَ (ئازادی خۆڕسکی ) ،ئازادییەکی سنوردار بەپێی مافی خۆت بۆ ئەوەی ئازادی خەڵکی تر هەڵنەلوشی، ئینجا ئەو ئازادیەش لەسەرحسابی کۆمەڵ وبەرژەوەندی گشتی نەبێت، ئازادی بیَ سنور بەرپرسیاریەتی زۆر لاواز دەبێت، کەچی لە ئاینی ئیسلامدا (کلکم راع...) واتە هەموو کەس بەرپرسیارن لە کۆمەڵ لەژێر خانەکانی لە ریکخستنی، لە پەرەپێدانی، لە دەستکەوتەکانی، لە زانست، لە سەوزایی، لە ژینگە، لە بەرژەوەندی گشتی.., لەکۆتایدا بەرپرسیاری لە بەرپا کردنی شارستانی دروست ، ئەوە بەشێکە لە بیروبڕوای ئاینی، لە هەمان کات کاتیَ ئاین دەستکاری دەکریَ یان لە ناوەڕۆك دادەڕنریَ یەکەم نیشانەی ئەوەیە ئازادی تیا نامێنیَ ،تا دەگاتە قۆرخ کردنی ئازادی وبیرکردنەوەش ، ئەو دەردە لە میژووی سیاسی و فقهی ئیسلامی بەدی دەکریَ ،لە مێژووی ئاینەکانی تریش، ئازادی بۆ عبری و خەلکی تر جیاوازی هەیە ،بۆ عبریەکان تەنها 6 سالە ئەگەر بیەویَ ئازاد ببی ،وەك لەتەورات هاتوە : ( إذا اشتريت عبداً عبرانياً فست سنين يخدم ،

---

[1163] فریدریك ئای هایك – الطريق الى الرق ص51

وفي السابعة يخرج حراً مجاناً ، إن دخل وحده ، فوحده يخرج ، إن كان بعل امرأة تخرج امرأته معه , إن أعطاه سيده امرأة وولدت له بنين وبنات فالمرأة وأولادها يكونون للسيد ، وهو يخرج وحده ، ولكن إذا قال العبد : أحب سيدي وامرأتي وأولادي لا أخرج حراً ، يقدمه سيده إلى الله ، ويقربه إلى الباب أو إلى القائمة ، ويثقب سيده أذنه بالمثقب يخدمه إلى الأبد)[1164]، جاريش وايه واهەست دەكرێ قۆرخ كردنى ئازادى و كۆيلدارى بە ڕەسەن دەكرێت ، وەك ئەوەى دەگۆترێ حامى كوڕى نوح (باوكى كنعان) نوحى تووڕە كرد ئەويش دوعاى لەو نەوانەى كرد تا ماون هەر كۆيلە بن وەك لەو ئايەتەى تەوراتيش واهاتوە :[1165] (ملعون كنعان عبد العبيد يكون لإخوته ، وقال : مبارك الرب إله سام ، وليكن كنعان عبداً لهم ) : ( ليفتح الله ليافث فيسكن في مساكن سام ، وليكن كنعان عبداً لهم ) ، لە پرۆتۆكۆلى ژ:1ى (بروتوكولات حكماو صهيون)دەليت (ان الحرية السياسية ليست حقيقة) وڕاى تريش هەيە دەڵێن : ئارامى وخۆشگوزەرانى ميلەتان لە ئازادى نيە بەلكولە دەسەلاتداريكى توندى ئۆتۆكراسى.

لە ئاينى يەهودى بەپێى ئەو تەوراتەى ئيستايان لە (وسايە العشر-ناموس)ى كەلە(سفر الخروج الأصحاح 20 )هاتوە نۆيەميان باس لە ريزگرتنى ئافرەت وكۆيلەو مانگاوماڵياتى دراوسێكان دەكات ، واتە كۆيلەدارى هەيە، لە فقهى مسيحى وهەندى كۆپى ئينجيليش رازى بوون بە كۆيلە بە عيبادەتى خوا هەژماردەكرێ ،ئازاد بوون بە ياخى بوون هەژمارە : الإصحاح السادس (5-9) : ( أيها العبيد ، أطيعوا سادتكم حسب الجسد بخوف ورعدة في بساطة قلوبكم كما للمسيح ، لا بخدمة العين كمن يرضى الناس ، بل كعبيد المسيح ، عاملين مشيئة الله من القلب ، خادمين بنية صالحة كما للرب ليس للناس ، عالمين أن مهما عمل كل واحد من الخير فذلك يناله من الرب عبدا كان أو حرا) ، ڕازى بوون بە ژێر دەستەو نەبوونى ئازادى كراوەتە بەشيك لە عيبادەت كەچى عيبادەتى راستەقينە دژى زوڵمە لەگەل ئازاديە ، لە بەشيكى زۆرى فقهى ملكەچى بۆ (ولى ئەمر)ديسان عيبادەتە ئەگينا تاوانە ، پێيان وايە پەيوەندى دەسەلات وهاوولاتى ئەوەيە ئەگەر كارى دەسەلات چاك بوو ئەوا پاداشى خواييان دەبێ وهاوولاتيش دەبێ سوپاسيان بكەن ،ئەگەر خراپەشيان كرد ئەوا

---

[1164] كتاب المقدس–عهدالقديم– الإصحاح (21) سفر الخروج ( 12 -2 ).

[1165] سفر التكوين– إصحاح (25/9– 27) .

دەبێ هاوولاتی ئۆقرە بگریت بۆ رۆژی دوای، ابن عبد ربە هەمان بۆچوون بەناوی ئاینی ئیسلام دووبارە دەکاتەوەو دەلێ: اذاکان الحاکم عادلاف لە الأجر وعلیك الشکر واذاکان ظالما فعلیه الوزر وعلیك الصبر)[1166]، ( عبد الکریم الخطیب)لة (الحسن البصري)دەگێڕیتەوە: ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعلیکم الشکر، و ان أساؤوا فعلیهم الوزر وعلیکم الصبر، وإنما هم نقمة ینتقم الله بهم ممن یشاء فلا تستقبلوا نقمة) گەلێ جاری تر رێك بە پێچەوانەی ئاینی ئەسل (هەر بەناوی ئاینەوە) کاری خراپ کراوە،ئاین بۆ دژی زولم هاتوە کەچی بەکاریان هیناوە بۆ مل کەچی مەزلوم لە قازانجی زالم ،قەشە ئۆگستین دەیوت هەژاروبەندەقەدەری خودایە نابی خۆ رزگار بکەن وئەو قەدەرە تیك بدەن ، ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملکوت الله) دەلێ (بۆیە خواعەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[1167].

لە ئاینی ڕاستەقینە پێگەی کۆیلایەتی و ڕازی بوون بە زۆرداری تاوانە (ظالمی انفس) هەژماردەکرێ، وەك (زانایانی فکری ئیسلامی بە پیچەوانەی زانایانی فقهی ئیسلامی)ووتویانە کۆیلایەتی دژی جەوهەری هەموئاینێکە مرۆڤ تەنها کۆیلەی خودایە نەك بەشەر،ئینجا دەشلێن مرۆڤ خاوەن مولکە خۆی نابێتە مولك بۆکەسیکی تر، ئاینی ئیسلام نەبوونی ئازادی بە نەبوونی ژیان هەژماردەکا بۆیە لەبەرامبەر خوێنی کوژراوێك رزگارکردنی عەبدێکە واتە لەولا مرد یەکی زیندوو کردەوە واتە عەبدایەتی بە مردن هەژمارکردوە ئەوەندە دوژمنیەتی (ومن قتل مؤمنًا خطأ فتحریر رقبه مؤمنة) ، لەسەر ئەو بنچینە قوولە زۆربەی بنەماکانی مافی مرۆڤ وئازادی بۆ ئەسلی ئاینەکان دەگەڕێتەوە ، (متی استعبدتم ..) بوویتە مادەی یەکەمی جاڕنامەی مافی مرۆڤ، .. هەتا ئازادی لە ئاینیش هەیە بۆت هەیە ئیسلام نەبیت،کافری تاوان نیە ، ئاین کێشەی لەگەل بێباوەڕی ونەیاری نیە، بەلکو کێشەی لە گەل زولم وزۆرداری هەیە ،کێشەی لەگەل قۆرخکاری ئازادی هەیە ، یەهودی و مەسیحی وئاگرپەرست هەرچی هەیە (لا اکراه فی الدین)، (وَلَوْشَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ

---

[1166] د محمد شحرور-الکتاب والقران ص101

[1167] مارکسیة قرن عشرین ص146

جَمِيعاًأَفَأَنت َتُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْمُؤْمِنِينَ ﴿يونس : 99﴾)، (فَمَن شَاءفَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءفَلْيَكْفُرْ ﴿الكهف : 29﴾)..ئەگەر ئازادی نەبیت و تۆبزی لە ئاین هەبێت ئەوا ئاین پێویستی بە خەلکە، ئەگەر ئازادی هەبێت ئەوە مانای وایە خەلکە پێویستیان بە ئاین هەیە ، ئیتر هاولاتی پابەند نەکراوە بە ئینتمای ئایینی، بۆیە لەناو خەلافەتی ئیسلامی زۆر ئاساییە مەسیحی و یەهودی و کافر و مشرك... تا ئێستاش هەیە،جارجاریش ئەو تۆبزیە کراوە بەناوی ئاین بەلام پالنەری سیاسی بوە ،لەسالی 1891سولتان عبدالحمید نامەیەکی هەرەشەی بۆ ئیزیدیەکان نارد داوای لیکردن یان ئیسلام بن یان جەنگ ،بەلام پاساوەکەی سولتان ئەوەبوو ئەوە تۆبزی و(اکراه)نیە بەلکو ئەوانە لە بنچینەدا ئیسلام بووینە دوای هەلگەڕاینەوە،دوای سوپای بەسەرکردایەتی (عمر وهبی)ناردو دەردی دانی[1168] ، بەشێکی تر لە خۆشەویستانی ئیمامی علی دەلێن یەکەم جار ئیمامی علی ئەو بنەمایانەی بۆ ئازادی داناوە ، بە پیی کتیبی (حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب**)** یەکەم جار چەمکی مافی مرۆڤ وئازادی وڕادەربڕین لای ئیمامی علی بەرجەستە بوە لە چوارچێوەی ئاینی ئیسلام (دعا الامام علي (ع) إلى أن ينعم الانسان بحق المساواة العادلة في ابعاده كافة سواء البعد الإنساني ، او الأجتماعي ، او الاقتصادي ، او السياسي ، او القضائي) ،هەتا بوونی معارەزەی سیاسیش( في حالة الاستبداد والظلم من قبل الحكام أزاء الأمة وتبديد حقوقها نتيجة ضعف الوعي والأداء السياسي والإداري ، فإن الامام يمنح الحق للامة بأفرادها ومجموعها بالتصدي للحكومة واخطائها تجسيداً لـحق المعارضة وبصورة تدريجية حتى تصل الى الثورة المسلحة للقضاء على الظلم والطغيان وذلك استناداً الى مبدأ الأمر بالمعروف والنهي عن المنك)[1169] .

ماوە ئەوەش بلێین گۆتەیەك هەیە گونجاوە بۆ ئێرە ڕەنگە لەسەردەمی زەردەشتیەکانەوە مابێتەوە کە لەبەلگەنامەیەکی بریتانی زیندوو کراوەتەوەو دەلێت :( حكم الكرد وحريه العالم)[1170]، نازانین چەندە

---

[1168] السياسات الاثنية فى العراق ص86-87

[1169] حقوق الانسان عند الامام علي بن ابي طالب ص201- و ص 472 و ص474

[1170] بەلگەنامەی بریتانی: File No .13/14 vol.v11. secret. Kurdish policy- New Delhi .Lndia.
وزارة الداخلية- 16شباط/1930 مذكرة سري ، رقم 646 \سي .

ڕاسته حوكمی كوردی ئازادی جیهانی تیّدا بیّت .

سنوری نیّوان ئازادی وفەوزا— ئازادی ستاندەری

بەگشتی دووڕای پیچەوانه هەبوەو هەیه ،بەشیك پیّیان وابوه ئازادی زیان بەخشەو مرۆڤ (جەبریانه) ڕەو بكا له قازانجیەتی ، بەشەكی تریش ئازادیەكی ڕەها دەوێ ، لەو سەردەمه بەشی یەكەم لاواز بوه ،بەشی دوەم له هەلسانه زیاتر،ئەگەر چی زۆرایەتی دام ودەزگای جیهانی باوەڕی بەوه هەیه كه بۆهەمو هەنگاو مافیّك سنور هەیه بەلام بەشیك هەر سوورن لەسەر ڕەهایی ئازادی، دەلیّن دەبیّ هەمو جۆره كۆت وبەندیك له پیش ئازادی هەلگیرێ، جا هەریەكه یەك لەوكۆتانەی(ئاینی-یاسایی-كۆمەلایەتی-سروشتی-..)پیّگرنگەلادرێ ،بەشیكیش داوادەكا هەموی لادرێ ، هەندیّكیش كۆت و زنجیرەكانی كۆمەلاّیەتی دەكەنه بارگرانی لەسەر سەربەستی تاك،شاعیری گەورەی كورد (فایق بیّكەس) دەلیّ:(یەكەم دوژمنی سەركەوتن و گەورەترین سوپەری كۆنەپەرستی عەیبه عەیبەیه.. ) فرۆیدیش دەلّیّ: نەریتەكانی كۆمەلّ فشاره لەسەر ئازادی تاك، تەنانەت وای لیهاتوه (قاموس حزب البعث) یش ئەو داوایه بكات كه خۆی وابەناوبانگه له ئەزمونی سیاسی ڕیّی لەهەمو ئازادیەكی گرتبوو ،دەلیّت: ( ئازادی مانای هەلگرتنی هەمو كۆت وبەندیبك له پیش مرۆڤ تا بتوانی ڕای خۆی دەربڕێ)[1171] .

ئەو ڕایەی سەروو وهەبوونی سنور بۆ ئازادی (بۆ هەموشتیّك) ئەسلیكی ئاینیه ، سەرچاوەی ئەو سنوره بۆ ئازادی-كەناویان ناوه (كۆت وقەید)هەموی كۆمەلایەتی ویاسایی وسیاسی نیه ،بەلكو بەشیكی سروشتی وخواكرده ،بەشیكیشی ناوەكی فسیۆلۆجیه ،هەر خودی یاسای سروشتی چ له ئاستی سروشتی (فیزیای وكیمیایی) چ له ئاستی ناوەكی(فسیۆلۆجی وبایۆلۆجی) بەشی زۆری ئەو سنوره دیاری دەكا، بەشیكی تریش له كۆی گشتی ئازادی خەلكی تر دروست دەبیّت ،واته خودی ئازادیش كۆت وبەند بۆ ئازادی دیاری دەكات ، مرۆڤ به ئازادی میژوو دروست دەكا كەچی له تیّكڕادا جۆریّك له یاساو قاوغداری بۆ گەشەی میژوو دروست دەبیّ وەك (مەندل) هەستی پیكرد، ئۆتۆماتیكی ڕاپیچیەكی لەگەله كه بەشی زۆری ئازادی لیداگیركردووی بیئەوەی هەستی پیّبكەی

[1171] تعريفات ببعض المصطلحات –مكتب الثقافة والاعلام ص31 .

،ئەوانە سنوری ئۆتۆماتیکین ، یاساو نەریتی کۆمەلایەتیو چالاکی سیاسی ستاندەر دەبێ ئەو سنورە تەئسیل بکا ،زیادەو کەمی زۆرداری لیدروست دەبێ، ئەو سنورە وادەکا ئازادی خەلکی تر زیانی نەبیت بۆخەلکی تر،لەوەوە مەوسوعەی (ستانفۆرد) پیناسی بنچینەیی بۆ ئازادی وادارِشتوە :(ئازادی نەبوونی زیانە بۆ خەلکی تر) ، بە هەمان شێوە مادەی(6) ی( إعلان حقوق الإنسان لعام 1791ا) هەمان داکۆکی دەکاو دەلێ : ( الحرية هي حق الإنسان في أن يفعل كل شيء لا يضر بحقوق الآخرين ) ، ئازادیەکەت سنوری سروشت وکۆمەلگە نەبەزێنێت، سنوری ئازادی کەسی دوەم نەبەزێنێت ، بۆیە یەکێ لە مەبەستە بنچینەییەکانی (یاسا) دانانی سنورە بۆ ئەو ئازادیانە و رێکخستنیانە.. کەواتە ئازادی بێ یاساو بێ سنوور نابێت نە یاساش بێ ئازادی دەبێ ، لە هەمان کات بەتەنها (یەکسانی بەرامبەر یاسا) ئازادی تەواو نابیت، واتە ئازادی بەیەك رِەهەند تەواونابیت ،هەمو رەهەندەکانی بە عەیار دیاری نەکرێت یان ئازادیت لێ داگیرکراوە یان ئازادی خەلکی ترت داگیرکردوە ، لەسەر ئەو بنچینەیە لە رۆژئاواش(کە پیشرِەوی بەهای ئازادین لەو سەردەمە)هەندێ قەیدیان لە دەستور داناوە بۆ دیاری کردنی ئەو سنورەبۆ ئازادی ،لەوانە:( یاسای بوختان و ناتۆرە- ئەوەی دەبێتە هۆی هاندانی خەلّك بۆ بەزاندنی ئاداب و ئەخلاقی گشتی - یاسای دژی سیخورِی و خیانەت و بەزانددنی سنوری ئاسایشی نەتەوەیی -یاسای نەبوونی تۆبزی بۆ گوێگرتن لێت، وەك مکبرەو بانگدانی گشتی - لە بارەی ئاینیش ) .

لە پرِۆتۆکۆلی (ژ:1)ی (بروتوكولات حكماء صهيون) دەلێت:( ان الجمهور بربري، وتصرفاته في كل مناسبة على هذا النحو، فما أن يضمن الرعاع الحرية، حتى يمسخوها سريعاً فوضى، والفوضى في ذاتها قمة البربرية) ، بەدیلی ئەو سنورە نۆرەی فەوزا دێت کەسنوریان لەگەل ئازادی لێك نزیکە ، کەلەو سنورە ترازرا ئەو کاتی توندرِەوی چەپی وراِستی (رۆژئاوایی ورۆژهەلاتی-لیبرالی وشیوعی) لەگەل توندرِەوی ئاینیش یەکدەگرنەوە، بە پێی (الموسوعه العربية ) زاناو فەیلەسوفی فرنسی ( برودۆن 1809-1865) باوکی فەوزەویە، پرۆدۆن(خاوەنی دروشمی : الملكيه هى سرقه)لە بارەی دەولەتیش (حكم الانسان للانسان هو عبوديه)،غاندیش رِای وایە ئەو مولکیە زیادەی لە پیویستی خۆت دزی

وگەندەلیە ، بۆچونە بەناوبانگەکەی ئەوەیە : هەرچی قەیدوشەرتە لەپیش ئازادی دەبی لابربیت [1172]،
ئەوە ڕێك دەبێتە کارکردن بەیاسای سروشتی ولەویش بۆ یاسای دارستان کە زاراوەی فیزۆکراتی بۆ دیاری کراوە ، هەندیکی تریش ناویان بە فەوزەوی باوە،لە ئەوروپا ئەدەبی تۆلستۆی ویاخی بوونە،(ولیام جۆدین) و(ماکس شتیرن) خاوەنی (نظریة تمرد الفردی)، هەروەهاکرۆپتکین وباکۆنین و..تەنانەت باکۆنین منافسەی خودی مارکسیشی دەکردو زیاتر مزایدەی شیوعایەتی لە خاوەنەکەی دەکرد، لە بەرامبەردا زاراوەی (ئازادی ئامانجدار-الحریە الهادفە- الحریات الموجهە) سەری هەلدا ، دەگەڕیتەوە بۆ ماوتسی تۆنگ ئازادیەکی دیاری کرد دژ بە فەوزاو بگونجی لەگەل دەستور ودیکتاتۆریەتی گەل ، ئەو بۆچوونە جاروابوە لای مەرجەعە گەوروکانیش بوە ، سبینوزاو لایبنتز ومارکس و فرۆیدو زۆری تر پێیان وابوە  تەنها خوا ئازادی تەواو بێت لە بوونەوەر ئەوەی تر دەبیَ نیوە بێت .

زیاتر ئەو مزایدانە لەبارەی ئازادی لە دوای شۆرشی فرنسی 1789 هات  ، دروشمی گشتی فەوزەوی: نا بۆ ئاین ودەولەت وتەخت وخودا )لایەنگری تیرۆریش بوون، ئەوانە دژی سزای (سەربردەی ح ئادەم)بووینە گوایە بەهۆی خواستی ئازادی نەفی کراوە بۆسەرزەوی ، دژی ئەو ڕوانگەن کە دەلیَ میژووی ڕیکخستن ویاسا لە دوای ئەو سزایەی (ح ئادەم) دەست پیدەکا ،ڕێگرتن لە یاخی بوون ،ڕێگرتن لە فەوزا ،بەشێکی گرنگی فلسفەی پەیامی ئاسمانی لێرەوە دێت ، مادام ئادەمیزاد بەو ئازادیە لە (مەخلوقاتی تر جیادەکریتەوە وەك پاپا شنۆدەی سێیەم وادەلیَ) پاپا شنۆدە دەلیَ ئادەمیزاد بەو ئازادیە لە دروستکراوی تر جیادەکرێتەوە (مسیر)نیە بۆیەش خۆی لەکارەکانی بەرپرسیارەو فلسفەی پیغمبەروپەیامەکانیش لەو ئازادیە دێت ،بەلام لەهەمولایەکیش ئازاد نیە ، بوونی لە نەتەوەو نەژادو زەمان وزەمین [1173].

ئیستا دەرکەوت بە پێی (چالاکوانانی ئازادی ڕەها) لەکۆتایدا سزاو یاساو ڕێکخستن مانایەکی نامێنێت ، کەچی لە ئاینی ڕەسەن تەواو بەپیچەوانە دەلیَ ژیان لە سزایە (ولکم في القصاص حیاة یا

---

[1172] الموسوعەالعربیة ج14 ص774 .

[1173] البابا شنودة الثالث – جریدة (أخبار الیوم ) السبت – 27–09–2005

اولي الالباب لعلكم تتقون ) ئازادی رەها نیە لەسەر مولك وخانەوادەو تەنانەت جەستەو عەقلی خۆشی ،بڵێ من خۆم دەكوژم ئازادم ، بەرامبەر هەمو جۆرە ئازادیە (نا ئازادی) هەیە كە بریتیە لە مافی ئازادی ، ئالێرەدا كۆتایی بەوە دێت كە ئازادی بیسنورو بێنیشتمان وبێدایك وباوك وبێناسنامە بێت ،فەوزەوی وعەبەسی نیە ، ئەوانەی دەڵین ئازادی پیناسی نیە (یاسپیرز —مارسیل-لاڤیل-شۆبنهاور-هۆبز-هیۆم) لەهەمان كات ئەوانەش كەدەڵێن مرۆڤ هەردەم مسەیەرە نەك ئازاد (سپینوزا —ماركس-ئەنجلس-لینین..) وانیە ، ئازادی ڕیشەی لە پەیامی ئاسمانی ولە ئایدیۆلۆجیای بەشەری هەیە .

ئازادی وباوەر بەگشتی ڕایەكی واهەبوە پیشكەوتن وتكنۆلۆجیا ئازادی لاواز دەكا،تەنانەت لە نێوهەندێ میلەتان باس لە پیشكەوتن وگەندەڵی بەجمكی دەكا،لەنێو عەشایەری عربی ڕەسەن ڕێسایەكی كۆمەلایەتی هەبوو دەووترا(البدوی اذا تحضر تفسد)،بەشیكی تریش لەجیهان فیزیۆكراتیەكانیان پێووتراوە ڕایان وابوە مرۆڤ بە دابڕان لەسروشت وڕووكردنە پیشكەوتن وتەكنیك وبازاڕ تێك دەچێ ،ئەوەی ئەو بۆچوونەی موكوم دەكرد ڕێسایەكی تری نیمچە ئەكادیمیە بەناوی( قوانین الاجتماعیه الكونیه )كە دەڵێت : (تضعف العلاقة الأنسانية في حالة التقدم المجتمع في الحقول المادية او العلمية والتكنولوجية).

لەو سەردەمەو لەدوای وەرچەرخانی جیهان لەژێر كاریگەری ئاینیەوە بۆ مەدەنی ودەستورو واپۆلین دەكرێ كە گوایە ئاین دژی ئازادیەو سەردەمی ئیستای بەشەریش ئازادی داهێنابێت ،تەنانەت فەیلەسوف وزانایانی دیكتاتۆریش ئەو تەنزیرەیان دەكرد، ئەنوەر پاشای عوسمانی وهتلەر مۆسۆلینی سەدام حسین رەخنەیان لە ئاین هەبوو لەبەر نەبوونی ئازادی ، ماركس خۆی وماركسیەكانی دوای خۆی هەمان ڕەخنەی توند تریان هەبوو ، هینانەدی ئازادیان بەستبۆوە بە رزگاربوون لە ئاین ، ئەوانە هەر هەلس وكەوتی دەسەلاتداری ئاینیان نەكردبوە پێوەر ،بەلكو هەندێ دەقی ئاینیش هەیە ئەو بۆچوونانەیانی پتەو دەكرد ،وەك لە (عهدالقدیم-سفر الحكمه)هاتوە : (ان جمیع الذین لم یعرفوا الله هم حمقی من طبعهم لم یقدروا

ان يعلموا الكائن من الخيرات المنظورة ولم يتاملوا المصنوعات حتى يعرفوا صانعها-سفر الحكمة 13: 1) . دەقە ئینگلیزیەکەی دەکرا نمونە :

Atheism word in Arabic and English, with the verse: "But all men are vain, in whom there is not the knowledge of God: and who by these good things that are seen, could not understand him that is, neither by attending to the works have acknowledged who was the workman" (Wisdom 13:1)

کەچی مارکس خۆی نەك هەر دژی دیموکراسی و دەست گۆڕی دەسەلات بوو بەلکو دژی ئازادی و مافی مرۆڤ وتەنانەت دژی دروشمی شۆڕشی فرنسی (ئازادی - برایەتی - یەکسانی)بوو ، دژی ( Freistaat )لەو سەردەمی بە سیستەمی کۆماری دەووترا.

ئاوانیە ، لە کۆنەوە ئاینەکان لایەنگری ئازادی بووینە ،بەپیچەوانە دژە ئاینەکان لەهەمان کات دژی ئازادیش بووینە ، (هرکلیت) هەم دژی ئاین بوە هەم دژبە بنەمای ئازادی و دیموکراسی بوە، لە کۆنتریش فەیلەسوف وزانایانی دژ بە ئاینی وەك زینۆن(300 پ ز)بۆ پاپای ئەسینا،مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(60-120) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوون دژ بە ئاین وئازادیش بوون ،.. ئەوانە بە (ستۆیلی)ناوزەد دەکران واتە: بەردەم پایە ماستاوچی،یان جاریش وایە پێیان ووتراوە(لووکی)،بە هەمان شیوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی، لەوەوەش شێوەیەکی دیکتاتۆری بەرپا دەبوو، وەك (گۆڤێر)دەلیّ ئەو جۆرە دەسەلاتە ڕەهایانە ئازادیەکی ڕەهای بەخۆدەدا، پابەند نابیّ بە یاساو دەستورو لە سیستەمی دیکتاتۆریەکانیش توند ترە[1174] ، ئەو جۆرە زاناو فەیلەسوفانە وایان دەکرد ئازادی خەلکی لای لای ئیمپراتۆر بەتەوای قۆرخ بکرێت .

رۆفائیلی هونەرمەند وینەی ئەرستۆوئەفلاتونی لەتەنیشت یەك وا دروست کردبووئەفلاتون ڕووی لە ئاسمان وئەرستۆش رووی لە زەوی بەو مانایەی یەکەمیان لاهوتی و دوەمیان ناسوتی، یان سادەتر

---

[1174] المعجم التحليل السياسي ص19 .

[1174] بۆ ئەو ووتەی لیپینتز بڕوانە: معجم المؤلفات السياسية ص236

یەکەمیان قیامەتی ودوەمیان دنیایی، ئەفلاتون ئاینی ولەڕێزی میلەت بوە وەك جون لویس دەلیٚ دەنگی میلەت وشاری بوە ،ئەرستۆش لە خزمەت داگیرکەرێکی وەك فیلیپی مەقدونی بوە، دوایش بوە فەیلەسفی رەسمی ئیمپراتۆریەت ومامۆستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایەتی بوو، میکاڤیلی بۆ بنەمالەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و تەنانەت (لیپینتز)دەی ووت ئەمیرمان وینەیەکی خوایە لەسەر زەوی...زانای هۆلەندی هۆگۆ گرۆتیۆس(1583-1645)بە دامەزرینەری یاسای دەولی وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکریٚ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بوە ، بنچینەی فلسفەی وجودی(بەتایبەتی بەشی سارتەری) ئەو ڕێسایە بەناوبانگەی ( دیستویفسکی)یە( إذا كان الرب غير موجودا، هذا يعني أن كل شيء مسموح) ئەگەر خوا نەبوو لیٚمان بپیچیتەوە کەواتە هەمو ئازادیەکمان هەیە تاوانیش بکەین . واتە ئازادی پیچەوانەی بوونی خودایە،خواهەبی مرۆڤ ئازاد نیە بەو ئازادیەی وجودی پیناسی دەکا .

ئەو تیڕوانینەی (ئاین دژی ئازادی) لەوە دێت کە ئیستا دەبینریٚ رۆژئاوا لە چ ئازادیەکەو وولاتانی عربیش لە چ دۆخیکی دیکتاتۆریە ،یەکسەر دەیگشتێنن بۆ میژوو ،لەلایەکی تریشەوە هەندی ئاینپەروەری تری کاریگەر بە عەقلیەتی ئەعرابی دژی ئازادی ومەدەنی و پیشکەوتن ومافی ئافرەت ودیموکراسی ومافی میلەتان و.. یەکجاری تیڕوانینەکە تۆخ دەکات، ئەگینا ئازادی ئەسلیکی ڕەسەنی هەمو ئاینێکە ،زادەی سەردەم وعەقلانیەت نیە ، هەر وورد بوونەوە لە ڕیشەی دروشمەکانی ئازادی ، دروشم ریزکردنی چەند زاراوەیەك بەتەنیشت ئازادی مانای سنوردارکردنیەتی لەلایەکی تریش مانای گەڕانەوەی چەمکی ئازادیە بۆ میژووی کۆن کە لە ئاین هاتوە
یەکەم جار لە ئەدەبیاتی یۆنانی بەشە ئاینیەکەی دروشمی (ئازادی ویەکسانی) لەلایەن ئەفلاتونەوە هاتوە ، ئینجا بزوتنەوەی ماسۆنی ئەو دروشمەی (ئازادی —برایەتی) وەرگرتوە ، دوای شۆرشی

---

[1177] جمهورية افلاتون- ص255

فەرەنسی پەرەی پێدا بوە(ئازادی - برایەتی - یەکسانی)[1178]، دوای لە( بروتوکولات حکماو الصهیون)یش هاتووە لەپرۆتۆکۆلی زایۆنی ژمارە (1)دروشمی : (برایەتی —ئازادی —یەکسانی )هەلگرتووە.،ئینجا(اتحادالترقی)دروشمی سێکوچکە (ئازادی،یەکێتی،یەکسانی) بەرزکردەوە، هەروەها حیزبی بەعسیش(یەکێتی—ئازادی- سۆسیالیستی)[1179]، وزۆر لای تر لەو سەردەمە و وەبگرە دروشم نیە توخمی ئازادی تێدا نەبێت ،

---

[1178] لـــە ئیســـتاوەش لـــەمادەی (2)ی دەســـتوری فرنســـا هـــەمان دروشـــم هەیـــە، ئـــەوە دەقەکەیـــەتی: مادة( 2): فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصـــــــل أو أو الـــــــدين وهـــــــي تحـــــــترم كـــــــل المعتقـــــــدات". . .

شـــعار الجمهوريـــة : "الحريـــة والمســـاواة والإخـــاء.

ومبدؤها : حكومة الشعب بالشعب وللشعب .

[1179] یەکەم جار لە دەستوری (تەئسیسی) حزبی بەعس (کە لە4-1947/4/6 دەرچوە) لەدیباجەکەی ئەو دروشمە واتۆمارکرا:البعث العربي الاشتراكي حركة قوميـة شعبية انقلابيةتناضل في سبيل الوحدة العربية والحرية الاشتراكية

(38)

## تەعريب التعريب Arabization

**( پاكتاوی رەگەزی ،دەمارگیری ،موالی ،موالی العتق، شعوبی ،الترويسيه ،علوج، ريكەوتنامەی قەتیف ، الرطانة، هاپلوگروب جی...)دەگریتەوە**

بە پڕۆسەی داگیرودەرکردنی کورد لە زێدی باب وباپیرانیان وهێنانی عەرەب بۆ شوێنیان دەووترێت تەعریب، کە بەشێکە لە چەمکێکی فراوان تر پێی دەوترێت (پاکتاوی رەگەزی)، کەلەگەل داگیرکردنی هەر وولاتیك ئەو پرۆسەیە ئەنجام دراوە ، وەك فرنسا بەرامبەر جەزائیر ،ئیتالیا بەرامبەر لیبیا ،..بەگشتی لە ئەفریقاو ئەمریکا وئاسیا وئوستراليا لەگەل نەتەوە ڕەسەنەکانیان کراوە ، کە ئەوانەن: لە بەرازیل (گوارنا، توینابا)، کۆلۆمبیا (نشیتشا)، پاراگوای (گواران)، پۆلیڤیا (أبهارا)، پیرۆ (انکا، کیشوا)، هندۆراس (مایا) ، ئوستراليا (پورجوان).. ، هەروەها لە ئیرلەندای سەرووش (گالی)زمانەکانی ئیرلەندای رەسەن مەزهەبیشیان (کاسۆلیکە) مەزهەبی ئینگلیز (پرۆتستان) ە دووچاری پڕۆسەی بە ئینگلیزکردن بوونەوە ، لەسەردەمی سۆڤیەتیش (بەتایبەتی سەردەمی ستالین) بە ڕوسی کردن دژی میلەتانی تر هەبوە ، ناوی نراوە (الترويسيه ) وەك ( الموسوعه الميسره) دەلێت بەو هەولانەی ستالین دەووترابۆ بە روسی کردنی زمان ونەریت وفەرهەنگی کۆمارەکانی تری سۆڤیەتی دەووترا [1180] ، بەروسی کردن واپێدەچی کۆن تربێت وەك فەرهەنگی سیاسی (ئارش) دەلی بەروسی کردن لەسەردەمی ئیمپراتۆریەکان ودواش لە سەردەمی شیوعیەتیش هەبوە بۆ تواندنەوەی میلەتانی تر لە روسی[1181] .

---

[1180] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص100 .

[1181] فەرهەنگی سیاسی (ئارش)ل84

له ڕاستیدا تاوانی زۆر گەورە بەرامبەر ئەو میلەتانە کراوە ،بەلام پاساو بیانۆی هەمە جۆریان بۆ داتاشینەو زاراوەیان بۆ دۆزینەوە ، گوایە لە چوارچێوەی( international caltivation analisis- تحليل انماوالدولى ) و (دونیە –inferiority ) یارمەتی ئیستعماری سەقافی بۆ گەشەی فەرهەنگی ئەو میلەتانەی مقەوەماتی مانەوەیان لاوازەبە هۆی باری کۆمەلایەتی وسیاسی و شارستانی وفەرهەنگی پێیان دەووتن ( ئەیتیما–atima) ، خاکەکەشیان بە بیخاوەن (ارض لاصاحب لها– res nnullius)ناوزەد کرابوو .

بەلام لەو سەردەمەی ئیستا بەدەگمەن ئەوکارە قیزەونە بەدی دەکرێ، کۆمەلێك بڕیاڕی نیودەولەتی دژی دەرچوە، لەوانە بڕیاڕی (ژ: 96)ی (خولی–یەك) دەرچووی 11/کانونی یەکەم/1946 ، لەناو ئەو وولاتانەش کۆمەلێك یاسای هاوولاتی بوون دەرچوە کۆتایی هاتوە،تەنها تەعریب ماوە دژ بە کورد ، بە جۆریکی تریش لەگەل فلستینیەکان دەکرێ .

**پیناس:** لە مەوسوعەو فەرهەنگە کۆنەکان مانای ( تعریب-Arabization ) بەو شێوەیەی ئیستا نەهاتوە ، لە( لسانُ العربِ): بانّه مصدر عرّب، وعرّب منطقه أي هذّبه من اللحن، وتعريب الاسمِ الاعجمي هو أنْ تتفوّهَ به العربُ على منهاجها، لە ( المعجمُ الوسيطُ) : التعريبَ بِأَنّهُ صبغ الكلمة (المُصْطَلَحْ) بصبغة عربية عند نقلها بلفظها الاجنيي إلى اللغة العربية ، لە ئەنسیکلۆبیدیە نوێیەکانیش هەر بەو ئارستەی کۆن ڕۆیشتوە وەك(الموسوعه العربيه العالمييه)ش وادەلی ونەهاتۆتە سەر ئەو جۆرە تەعریبەی ئیستا .

بەلام پیناسی سیاسی وفەرەنگی تەعریب هەمان ڕێڕەوی پرۆژەی یەهودی (ارض بلاشعب لشعب بلا ارض) گرتە بەر دژ بەکورد ، کە لەکۆنگرەی لندنی 1840درا بالمرستۆن سەرۆك وەزیرانی بریتانیا ، کە لە دوای لە پرۆژەی ئیستتیتانی یەهودی دژ بە فلستینی خۆی دیتەوە ، یەکەم مستەوتینی یەهودی لە فلستین لەسالی 1878 لە گوندی (ملبس) کراوە بە ناوی (باب الامل–پیتا تیکڤا)[1182] ،لەو بارەیەوە جمال عبدالناسرنامەیەك بۆ (جۆن کندی) سەرۆکی ئەمریکا دەنوسی زۆر وێچووی

[1182] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ص70 .

تەعریبی کوردستانەو پیناسیکیشە بۆی،لەنامەکە هاتوە:(قد اعطی من لایملك وعدا لمن لایستحق،ثم استطاع اثنان(من لایملك) و(من لایستحق)بالقوة والخدیعة ان یسلبا صاحب الحق الشرعی حقه فیما یملکه وفیما یستحقه)[1183]،ئەو پرۆسەیە بەسەر خەلکی کوردستان هێنرا بەلام بە خراترو بێویژدانە تر.

<u>دانپیاهێنانی فەرمی بەتەعریب:</u> پرۆسەیەکی مێژوویی هەیە لە ئەنجامی چالاکی کۆمەلایەتی وئابووری ...دیزاینی دیمۆگرافی دەگۆری ، وەك لە شام وسەرووی ئەفریقا بەو هۆیەو بەهۆی زمانی عربی وقورئان ڕوویدا پێی ناووتریت تەعریب ،پالنەری تعریبی ئیستا مانایەکی ڕوون دەبەخشێ ، گوزارش لە لاوازی شارستانی وفەرهەنگی دەکات،بۆیە هەول دەدرێت مێژووی خەلکی ترە کەسایەتیەکانی تریان خۆمالی بکەن ،هەولدراوە صلاح الدینی ئەیوبی بکریتە عرب ،گارق بن زیاد زانایانی تری ئیسلامی ..یەك مانا دەبەخشێ ئەوەی ئەو تەقەلایە دەدا واهەست دەکا ئەو پێویستی بەو تەعریبە هەیە ئەگینا لاوازە ،ڕاستیەکەشی ئەوەیە ئەگەر ئیسلام لە عرب دەرکیشی وەك (عربی پەتی)لە شارستانی وفەرهەنگ لاوازن ،ئیبن خەلدوون بەڕوونی دەری خستوە ،(علی قاسمی) دەلێت شارستانی عربی وشارستانی ئەوانەی بە زمانی عربی قسەناکەن تەواو لیکجیایە[1184] ،شارستانی عربی پەتی100سالە(لەدوای سایکس پیکۆ دەست پێدەکات، لەوەش زۆر وێرانە هەروەك لە دیباجەکانی (پرۆژەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست) باس کراوە ،بۆیە پێویستی بەتەعریبی هەمەلایەن هەیە دژبەو میلەتانەی لەو دەمە کەسایەتی بە هێزی دەولی نیە .

کەواتە مەبەست لەتەعریب ئەوەیە بە نەخشەو پلان و فەرمان لەلای دەسەلاتدار دادەرژری، حکومەتی ئیستای عیراق بە فەرمی چەند جارێك دانی بەو پرۆسەیە ناوەتا دەگاتە دەستوریش : لەبڕگەی(ب)ی مادەی (58) (قانون اداره الدوله الإنتقالیه-2004ز) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب ودەستکاری سنوری ئیداری دەهێنی دژ بەکوردستان لەو ناوچەیە کراوە، ،لیژنەی جیبەجێ کردنی مادەی (140)ی دەستوری بە پێی فەرمانیکی دیوانی ژ:46 –(م ر ن/48 /1373) لە (9 / 8 /2006 ) دەرچوە ، لەسەرئاستی نێو نەتەوەیش لە بڕیاڕی ژ:1770ی رۆژی

---

[1183] فلسطین فی الرسائل عبدالناصر وکندی ص22 .

[1184] المعجمیة العربیة بین النظریة والتطبیق ص114-

2007/8/10 (دانیشتنی ژ: 5729)سەبارەت بەو ناوچەو دیاری کردنی (ستیڤان دیمستۆرا) وەك نوینەری نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ناوچە ناکۆکەکانی دەوروبەری کەرکوك.

لەسەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکوردلەلە خالی(8)ی ڕێکەوتنامەی (11)ی ئاداری 1970(إعاده سكان القرى العربيه والكرديه الى اماكنهم السابقه..) .

له دوای دروست بوونی دەولەتی عیراق لە 1921 ئەوکێشەیەهەبوە لە: 1936 ،1958 ،1966، 1974،1970، 1983 ،1991، ..کە بەلگەن پرۆسەی تەعریب لەگەل دروست بوونی دەولەتی عیراقی دەستی پیکردوە ، یان وورد تر : هەر دەولەتی عیراق وخودی عیراق لەسەر بنچینەی تەعریب دروست کراوە (لەلایەن بریتانیاو سایکس پیکۆ وحکومەتی عیراقیش جیبەجیی کرد) .

**<u>فەترەی سەرهەلدانی تەعریب:</u>** بۆلێك جیاکردنەوەی دو جۆر تەعریب، تەعریبێکی بێمەبەستی کۆن(تەعریبی فقهی) کەپیناسەکانی سەروو ئەو جۆرە دەگریتەوەلە برگەی داهاتووش باسی دەکەین ،لەگەل تەعریب بەپالنەری عروبی سەردەم ، تەمەنی تەعریبی عروبی دیاری دەکرێت کە لەدەوروبەری ئەو ڕووداوانەی خوارەوە سەرهەلدەدات:

1-لەکۆتایی جەنگی جیهانی 1914- 1918 و بەسەرکەوتنی هاوپەیمانان (ئنگلیز، فەڕەنسا، ئەمریکا) ، تەوەری دۆڕاویش لەو جەنگە ئەلْمانیا و عوسمانلی بووکە بە(دول المركز)ناو برا بوون.

2-سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر 1917 و سەرهەلْدانی شیوعیەت.

3- لاوازبوون و دارِمانی خەلافەت کە لە ناوەڕاستی سەدەی 19 دەست پێدەکا، لە سالْی 1924 بە یەکجاری هەلْوەشێنرایەوە.

4- سەرهەڵدانی فکرەی نەتەوەگەری و عەلمانی و تەیاری عروبی ،یان فراوان تر پەیدابوون و جم و جۆلی سێتەوەرەی ئایدیۆلۆجیای ناشیۆنالیزمی (زایۆنی - تۆرانی - عروبی) لەناوچەکە.

5- وەرچەرخانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی و دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و دەڤەری، وەك تورکیا، عێراق، سوریا..

6- دروست بوونی جامیعەی عەرەبی لە جیاتی جامعەی ئیسلامی ،ئەو کاتەی جامعەی عربی دروست بوو شیخ امجد زهاوی چوە سەردانیان وزۆری هەولدا جامعەی عربی نەبێت ببیتە جامعەی ئیسلامی ،بەلام بەگوێیان نەکرد،دوای تیگەیشت ئەوە سەردەمی عروبەو تەعریبی ئاینیە ولەلایەکی تریش بۆ تەواوکردنی سایکس پیکۆ وبەلینی بەلفۆرو دامەزراندنی دەولەتی ئیسرائیله[1185] .

<u>**ڕیشەی تەعریب**</u> :(تەعریبی فقهی کراوە نەك تەعریبی ئاینی )

تەعریبی ئیستا وای کردوە تویژەرو لیکۆڕەوەیەکی زۆری جیهانی و دەڤەری پرۆسەی تەعریب (بگشتێنن) و بڵێن خودی ئاینی ئیسلامیش ڕەهەندی تەعریبی تێدایە، لەسەر ئەو بنچینە لەلای توێژەری کورد ڕەگی تەعریب بۆ قولایی مێژوو و سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی دەگێڕنەوە، جاریش وایە فەتحی کوردستان بە ئەنفالی یەکەم پۆلین دەکەن، ئەوەی بەعسیش بە ئەنفالی دوەم ، بەوەش خزمەتێکی بەخۆڕایی تەعریب دەکەن و لە ئەستۆی فکری ناشیۆنالیزمی دادەڕنن وشریکێکی گەورەی بۆ پەیدا دەکەن کە شەریکی نەبوە لە میژوو، ڕاستیەکەی وانیە ،خودی ئاینی ئیسلام تەعریبی تێدا نیە ،( یا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكروأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم)[1186]،وفەرمودە (لا فرق بين عربي و لا أعجمي و لا أبيض

---

[1185] الامام امجد الزهاوی –کاظم المشایخی ص220 .

[1186] القران الكريم– الحجرات:اية 13.

ولا أسود إلا بالتقوى)لەدوا وەسیەتی پێغمبەر(د خ)یش ئەوانەی ساغ کردەوە، کۆتایی پێهێناوە ، لە شیعریکی ئیمامی عەلی:

الناس من جهة التمثيل اكفاء ابوهم ادم والام حواء

نفس كنفس وارواح مشاكسة واعظم خلقت فيهم واعضاء

لە ڕاستیدا هەولدراوە ئاین تەعریب بکرێ سەرکەوتو نەبوون ، ئەوە بەشێکە لە فقھ ڕەهەندی تەعریبی بە ڕاشکاوانە تێدایە ، لە فقھدا سەرکەوتو بوون بەلام کاریگەریەکەی زۆر نەگەیشتە کوردستان ،تا (ناشیۆنالیزمی عەلمانی) بە تەعریب هەلساو کاریگەریە گەورەکەی بەتوندی گەیشتە کوردستان .

لە مێژووی نویێ عەرەب ئەوەندە دەسەلاتدار نەبوە ، عەرەب میللەتێکی زۆر بون کەچی دەسەڵاتیان زۆر لاواز بوو، لە نێو عوسمانی نەدەگەیشتە ئاستی کوردو چەرکەس و ئەوانەی تر، ئینجا لە نێو ویلایەتەکانی عەرەبیش کەمتر وەك کورد خاوەنی میرنشین و دەسەڵاتی خۆجێیی بووینە، چەندین سەدە بوو هەر ژێر دەستە بون، عبدالرحمن بەزاز دەلێت لەوەتەی سالی 1258ز وە عەرەب ژێر دەستەو بیێ دەولەت ودەسەڵات بون[1187]، فۆرستەر دەلێ: 7 سەدە عەرەب ژێر دەستە بون[1188]، لە ڕۆژی 3/تشرینی یەکەم/1932 ی بە بۆنەی وەرگیرانی عیراق لە (عصبە الامم) سکرتیری عوسبە (مسیۆ پۆلتس) وتی: ئەوە چەندین سەدەیە عەرەب ژێر دەستە بوە بۆ یەکەم جار بتوانن سەروەریەکانیان بەدەرخەنەوە .

**تەقەلای ئاینی** : لەگەل قورئان هیچ بوارێك نەبووە ،وەك لەسەروو ئایەتی یەکلاکەرەوەیە،زیاتر لەوەش هەندێ ئاماژە لە ئایەتەکانی تر نەك فەزلی عرب بەلکو واهەست دەکرێت باسی دوو میلەت بە خراپی دەکا ،عرب و یەهود،یەکەمیان بە (اشدکفرا)دوەمیان بە (اشدعداوە) بەلام دوای (وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا) هەموی دەکاتەوە برا، ئەگەر ئەو ئایەتە نەبوایە ڕەنگە عرب و یەهود بە چاویکی سوك تەماشا بکرانایە، بەتایبەتی ئەو میژوە خراپەی شارستانیش وەك ئیبن خەلدوون

---

[1187] العراق من الاحتلال الى الاستقلال ص30 .

[1188] فورستر– نشأة الدولة العراقية ص49

وەسفیان دەكا ،كەواتە بواریكی وا لە قورئان نیە بۆ بەهیز كردنی پێگەی ڕەگەزی عرب ،جگە لەوەی تەئویل و تەفسیر بگۆڕن ،هەولدراوە تەفسیری ئایەتی (كنتم خیر أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله) بلێن ئەوە لەگەل ئومەی عربیەتی ، كەچی مێژووی بەكارهێنانی زاراوەی (ئومەی عربی)بەو مەبەستە سیاسیە تازەیە، ئومەی عەرەب لە مێژووی ئومەتان ناوزەد كراوە وەك لە (طبقات الامم)ناوی عەرەبیش هاتوە ، بەپێی (معجم الشامل للمصطلحات الفلسفیة) ساطع الحصری یەكەم كەس بوو زاراوەی (الامە العربیە)ی لە جیاتی (ناشن) دانا، بەشیكی تر دەلێن نجیب عازوری لەسالی 1905لەكتیبی (یقظة الامة العربیة )ئەو زاراوەیەی بەكارهیناوە ـ دووریش نیە یەكەم جار جمال الدینی ئەفغانی بەكاری هێنا بێت ، بەهەمووبارێك مێژووی بەكارهێنانی امە العربیە لە سەدەیەك تێ ناپەڕێ، یان وەك (ئەلبیرت حۆرانی)دەلێت بەرهەمی سەدەی بیستە[1189].

ناچار وەك بیدعە زاراوەی (امتی العربیە والاسلامیە)بەكاردێت بەمەبەستی ئەفزەلیەت دانیك بەخۆ ، تاڕادەیەك توانیویانە هەندێ فەرمودە دروست بكەن ، بەتایبەتی لە سەردەمی ئەمەوی ودواتریش ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرموودە)ی وەك (حب العرب ایمان)، (العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)، بوویتە هۆی سەر هەلدانی فقهی (فەزلی عەرەب)، ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرموودە) ،پالپشت بەو بۆچوونە گەورە مونەزیری ئیسلامی عەرەب ئەنوەر جوندی دەلێ: العرب مادة الاسلام، اختار الله تبارك وتعالی العرب لحملة رسالة الاسلام ،..وعلاقة الاسلام بالعروبة هی علاقة عمیقة الجذور بعیدة المدی حتی تكاد ان تكون علاقة عضویة)[1190] لێرە جیاوازیەكی نامێنی لەگەل ناشیونالیزمیەكان،مادام باسی(علاقة عضویة)دەكا دەگاتە ئاستی نازی كەلەسەر بنچینەی چەمكی (فۆلك)بنیاتنرابوو ، زاراوەی ( فولك)لە ( الموسوعة الیهود والیهودیة والصهیونیة)راڤەی كردوەو دەلێ سەرباری پەیوەندی سیاسی ویاسایی نێوان میلەت وهەریم گوزارش لە پەیوەندی ئۆرگانیكیش دەكا نیوان هەندی میلەت وخاكەكەی ، وادەكات كە پەیوەندی سیاسی ویاسایی و (ئۆرگانیش)لە نیوان میلەت وخاك ودەسەلاتی سیاسی دروست ببیت

---

[1189] البیرت حورانی – الفكر العربی فی عصر النهضة – ت: كریم عزقول ص267 .

[1190] بروانة : معلمة الاسلام –م2 –العرب والاسلام ص260–269

دەگاتە رەگەزپەرستی[1191]، ئەوەلەلایەن ئاینپەروەرانیان هەندیك ناشیۆنالیزمی تر ڕەتی دەدەن لە کتێبی (العروبه بين الشعوبيه والإستعمار)دەلێ خواش بۆ پیادەکردنی پەیامەکانی پێویستی بە ئەخلاقی عرب هەبوە!!، لەکۆتاییدا دروشمی (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة) بەرجەستەبوە .

پالپشت بەوە هەندێ ئەگزیۆمی تریانداهێناوە وەك زمانی فریشتەو قەبروقیامەت گوایە عربیە ،بەو هۆیەوە تەقەلای گۆڕینی شوینەکان بکەن ،تیایدا تەعریبی مێژوو و جوگرافیی و چەمك و قورئان بکەن ،ح ئادەم لە غۆکلاندی هند دابەزیە بلێن لە یەمەن وجزیرە دابەزیە،جودی لەکوردستانە بلێن لە یەمەنە ،مانای (ئەعرابی)بگۆڕن بە خەلکی گوندان ...

زۆر ناوی شوێن وشاروشارۆچکەتوشی ناوگۆڕین بووینە بۆ عربی بە بیانۆی ئەوناوانە ئەگەر عربی نەبێت فریشتەی نایەتێ چونکە بەس عربی دەزانن بخوێننەوە، ئەگەر تەعریبیش نەکرابن دووچاری سەرو گێلاك شکاندن بوون و لە ناوە هاوتا عەرەبیەکانیان نزیك دەکرانەوە،گریندادا بوە غرناتە ، ئامێدی بوە عمادیە، (نۆ گرد) کرا (حديسه) ،دەیان گوت سنجار عربیە لە(هذا سن جبل جار علينا)هاتوە[1192]، سامراش لە (سر من رأى) ،تەنانەت بەشیك بەوە نەوەستاون هەولیان داوە بنچینەی عربی بۆ ناوی(ح ئادەم) ببیننەوە کە بە هەمو زمانیك هەر ئادەمی پێدەلێن ولەسەردەمی ئادەم زمانی عربی وکوردی وتورکی ..نەبوە ،ئەوە تەقەلایەکەیە( سمي آدم من أدمة الأرض. وقال آخر: لأُدمة جعلها الله تعالى فيه والأُدمة هي القرابة والوسيلة..)[1193]، لەکاتیکازۆربەی ئەو ناوانە کوردی وعەجەمی بووینە ، بابل لە باڤیل هاتووە، بەغدا لە باخی داد هاتووە، ، سامرا لە (سام — ری) هاتووە موصل لەبنەچەدا ناوی (نو ئەردشیر)، حديسه (نۆدێ) [1194]...،ئەنبارناوی ڕەسەنی (فیروزشار) ، خليج عربی ناوە ڕەسەنەکەی (کەنداوی عەجەم )،لە هەمو نەخشە کۆنەکان تا سەرەتای

[1191] بۆ زیاتر لەبارەی زاراوەی فۆلك بڕوانە: الموسوعه اليهود واليهوديه والصهيونيه ج1 ص28

[1192] بۆ ئەو مەبەستە توێژینەوەی بە پێزی(وێنەی کورد لە زانینی مێژووی ئیسلامیدا) بخوێنەوە.

[1193] بڕوانە تویژینەوەیەکی (د. قيس مغشغش السعدي) بەناوی(الجذور اللُغوية لبعض المصطلحات المندائية) .

[1194]ـ بروانە (توژینەوەی ماجستیری) بەندە: الاسلام و العلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة ص 195 ـ200 هەروەها بروانە: ابن بەتووتە، معجم البلدان، ...

سەدەی بیستەمیش هەر بە کەنداوی عەجەمی یان فارسی هاتوە ،عربی نەبوە تا یەکەم جار(رۆدین ئۆدین)ی بریتانی لەسالی 1957ز ووتی ئەو ناوە هەلەیە ئاوەکانی کەنداو عربین دەبێ کەنداوی عربی بێت ، لەرێکەوتنەکانی بریتانی و شیخەکانی کەنداو هەربە فارسی واهاتوە[1195] ،لە ئەدەبیاتی حکومەتی عیراقی (سەردەمی مەلەکی)هەر بە کەنداوی فارس هاتوە ,لە(مذاکرات مجلس التأسیسی عراق) هەر بەو ناوە هاتوە[1196],لە دائرەی معارفی بوستانی-کە لایەنگری عروبەیە لەمادەی (ئابشیرین))بە خليج العجم هاتوە[1197]، لە نەخشەی ئیداریعوسمانی سالی1893دووبارە هەروا هاتۆتەوە،بەهەمان شێوە لە مادەی(1)ی ریکەوتنامەیەکی بریتانی –سعودی ناوەکە بەکەنداوی فارس هاتوە ،ئەوەش دەقەکەیەتی :

نص معاهدة دارين، أو معاهدة القطيف، بين الأمير عبدالعزيز بن سعود وبريطانيا 18 صفر 1334هـ /26 ديسمبر 1915م.. (7 مادة):

**أولاً:** تعترف الحكومة البريطانيةوتقر بأن نجد والحسا والقطيف والجبيل وتوابعها والتي سيبحث فيها، وتعين أقطارهافيما بعد ومراسيها على خليج فارس هي بلاد ابن سعود وآبائه من قبل. وبهذا تعترف بأن سعود المذكور حاكماً عليها مستقلاً، ورئيساً مطلقاً على قبائلها، وبأبنائه وخلفائهبالإرث من بعده، على أن يكون ترشيح خلفه من قبله ومن قبل الحاكم بعده، وألا يكونهذا المرشح مناوئاً للحكومة البريطانية بوجه من الوجوه، خاصة فيما يتعلق بهذهالمعاهدة.

لەلایەکی تر هەولدراوە لە سیرەی پیغمبەر(د خ) عروبایەتی لیَ بدۆزنەوە یان راست تر دروستی بکەن لەو بارەیەوە گەورە مونەزیری عروبی (محمدعزە دروزە)کتیبیکی نوسیە بە ناوی (سیرە الرسول –ص)لەوێ زۆر باسی وای تیدایە ،(میشیل عفلق)یش کتیبی (ذکری رسول اللة)ی هەیە ،سەرکەوتو نەبوینە

---

[1195] بۆ ئەو پرسە بروانە: احمد السامرائی –ایران والخلیج العربی ص13 و ص66-

[1196] الحکومە العراقیە (وزارە الداخلیە)-مجموعە(مؤکرات المجلس التأسیسی العراقی) لسنە 1924م ,مگبعە دارالسلام/بغداد ج1ص35.

[1197] بروانة : المعلم بطرس بستانی –کتاب دائرة المعارف ج1ص318

،هیچ بەلگەیەك نیە ڕەهەندی عروبی لە چالاكی پیغمبەرو هاوەلەكانی بدۆزیەوە ، ئەو تەقەلایانەی دراوە گوایە سەردەمی پێغمبەر عروبەی كردوە ، یەكێ لەوانە تەقەلاكانی(د. احمد سوسە)بۆ دۆزینەوەی جێكەوتێك لە قولایی مێژوو بۆ عروبەی عیراق واهاتوە: پێش 4000سال لەمەو بەر (واتە: 2300پ ز) بابلیەكان نەخشەیەكی جیهانیان بە پێی زانیاری ئەو سەردەم كێشاوەو ناوی بابل وئاشوریان بە پیتی هیموگلۆفی خستۆتە سەر لە ژێر ناوی یەكەم ودوەم ، د. احمد سوسە هەڵساوە ئەو ئەدرێسەی بە (اقدم خارطة للعالم توضع فیها العراق) گوزارشكردوە، ساختەیەكی زۆر گەورەیە لەگەل مێژوو ،بەهەمان شێوەش ویستویەتی ڕەهەندی عروبە بداتە شۆڕشی پێغمبەر ودەڵێت: (بعد أن اتمت الجیوش العربیة تحریر العراق من الحكم الفارسي أصبح العراق جزءا من الدولة العربیة الكبری، وكانت هذه الدولة قد اسسها الرسول[1198] .. ئەو تەقەلایانە هیچ بنەمایەكی نیە ، ئەوە تەقەلایەكی گەورەی تەعریبی مێژوو وناوی عیراقە كە لەبنەچەدا عەجەمیە ، ئەو ناوچەیەی ئێستای عیراق زیاتر لەژێر دەستی فارس بووە، زۆربەی هەرە زۆری شارەكانی وەك بابل و بەغداو سەلمان پاك و سامرا... لەلایەن ئەوانەوە دروستكراون و ناوی فارسین دوای گۆڕاوون، خودی ناوی عیراق لە (ئەراك) ی فارس هاتووە بەمانای شاری شاهان[1199]، یاقوت حموی لە (معجم البادان) دەڵێ بەغدا هەرموڵكی عەجەم بوە[1200] ، هەموشی لەلایەن عەجەم دروست كراون وەك ئیبن خەلدوون دەڵێ: عەرەب (مەبەستی عەرەبی ڕەسەن، بەدەوی) شارستانیان تێكداوەو عەجەمیش بینای كردووە[1201]، لە كتێبە كۆنەكان عیراق لەسەر عەرەب پۆلین نەكراوە[1202]، ئیبن بەتوتە لەناوی عیراق لە بلاد العرب تیا

---

[1198] الحضارة في العراق ص321

[1199] أ ـ ئەلرازی ـ صحاح ب ـ معجم البلدان ـ یاقوت حموی ج ـ لسان العرب.... زۆر سەرچاوەی تر.

[1200] (معجم البادان ج1ص456 )

[1201] ـ بێجگە لە ساسانیەكان هەریەكە لـە: ئەكـەدی (2334-2154ق.م)، ئـۆر( 2112-2004 ق.م)، بـابلی كـۆن( 1162-2004 ق.م)، ئاشوری (2000-612 ق.م)، بابلی دواتر (626-539 ق.م)، ئـەخمینی (539-330 ق.م)، هیلنستی( 331-126 ق.م)، فارس(227-126) ق.م داگیریان كردوە.

[1202] ـ كتێبەكانی: ( معجم البلدان) و (قاموس الأعلام)و (سیاحتنامە) و(شرفنامە) كە لەسەدەی (16)دەرچوە: (اشار الی بلاد الفارس، وجاء فیە انها تشمل: عراق العجم، أذربیجان، أرمینیا، عراق العرب) .

نەهاتوە[1203]، لەنامە وەڵامەكەی ئەرستۆش بۆ ئەسكەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئێرانشار وعەجەم دەبا[1204].

ئەو جۆرە بانگێشەیە بە نەفامی (جاهیلیەت) حساب بووە لەلایەن ئاینی ئیسلام وەك پیغمبەر(د خ)ڕووی لە ئەبازەڕكردو پێی ووت:(یا أبا ذر إنك امرؤ فيك جاهلية )، (امە)ش زاراوەیەكی ئاسۆییە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە بەپیل بانگی ئیسلام چووینەودەچن، جا كوردە، عەرەبە، فڕەنسیە،نەتەوەیی زاراوەیەكی ستونیە زۆر دوورە لە (امە)،"وەلا" بۆ ئومەیەو "ئینتما"ش بۆ نەتەوەیە. ..هەر بۆزانین كوردیش لە كاردانەوەی ئەو هەنگاوە جاهلیانە ئاساییە دووچاری ڕەهەندی جاهلی دەبیتەوە وەك (نەوشیرەوان مستەفا) رەخنە لە داهینانیكی رەوشەنبیرو میژوونوسانی كورد دەگرێت لەبارەی دیاری كردنی (سالی كوردی)،گوایە لەبەرامبەر سالی زاینی دیاری كردوە ،كەچی ئەو سالە (وەك نەوشیرەوان مستەفا دەلیت) یادیكە جێی شانازی نیە چونكە هەندێ هیزی عەشایری دڕندە هاتونە نەینەواو شارستانیەتی ئەو شارەیان تێك وپێك ڕوخاندوە[1205] .

**تەعریبی فقهی:** لە سەردەمی ئەمەوی ئەو داهێنانە دێت ،لەو كاتیەوە تەقەلایەك لەلایەن نوسەری عەرەبی ئیسلامی هەبوە تا ناوی شارو وولاتەكان بەزمانێكی پیرۆزو ڕەسەن گوزارش بكا، دەیان ووت زمانی ڕەسەن وبەهەشت وفریشتە زمانی عربیە ،بۆ یەكەم جارلەسەردەمی عبدالمليكی كوری مەروان(65-86)ك بۆ تۆماری باج(خراج) زەوی ناوەكان لە هەمو وولات بە عربی تۆماركران ،هەر لەسەردەمی ئەو لە75ك بەرامبەر 696ز زمانی عەرەبی كرایە تاكە زمانی فەرمی نەك هەر

---

1203 (الكتاب الروض المعطار فی خبرالأقطار مادة: بلاد العرب ص163

1204ـ ئەوە نامەی ئەسكەندەرە:... أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة .. ئەوەش نامة وەلآمی ئەرستۆیة بۆ ئەسكەندەر كة هەردووكیان لەكتێبی (ابن مسكوية -تجارب الأمم ج1 ص23)وەرمانگرتوە: ... فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب...

1205 نەوشیرەوان مستەفا- بەدەم ڕێگاوە گولچنین ك1 ل12

لەدەولەت بەلكو بۆ تەواوی میلەتی موسولمان[1206]،لە دوای ئەزمونی خەلافەتی راشدین لادانیکی مەترسیدار لە ڕێڕەوی ئاینی ڕاستەقینە بەرەو دەمارگیری خیلەکی وڕەگەزی نەفامی بەدی دەکرێ ، ئەوەی لەئەمەویەکان نەبوایە بە موالی ناو دەبرا یان (علوج)، زاراوەی موالی هی سەردەمی پیش هاتنی ئیسلامە ،دەگۆترا(موالی العتق) بە کۆیلە ووتراوە لەسەردەمی نەفامی عربی پیش هاتنی ئیسلام ، لە سەردەمی عەباسیش بە شعوبی ،ئەو تیڕوانینە زۆر بە ڕوونی لە پانتاییەکی فراوانی فقهی ئیسلامی ڕەنگی داوەتەوە، لە فقهی ئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەد و ئیمامی مالیك ومیراتگرانی وزۆر بە زەقتر لەفتواکانی ابن تیمیەوعەرەب بەسەر عەجەم وکورد(فەزل)کراوە، هەرچەندە دەقی ئاشکرا دژ بە(فەزل)هەیە لەسەر بنچینەی ڕەگەزوڕەنگ وچینایەتی ،کەچی لەسەردەمی ئەمەوی باوی وەرگرت ، زۆر کتێب وسەرچاوەی گرنگی تر بە ڕوونی دەری دەخا کە (زۆربەی)ئەهلی سونە وجەماعە پێیان وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیەو ئیمام دەبێت لە عرب وقورەیش بێت ،لە مەزهەبی شیعەش ئەو دەردە بە جۆریکی تر هەیە ئیمام دەبیّ لە (ئالوبەیت)بێت ، هەریەکە لەو ئیمام وپیشەوا فقهیانە زیاتر لەوانی تر ئەو بۆچونەیان هەبوە ،ئیمام: شافعی —احمد- مالك-ابن تيمية —ابن قيم-ابوقاسم زمشخرى —حافظ العراقى - إمام الهيثمي - وإسحاق بن إبراهيم -عبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور جاحيز و..(ابن قتيبة ) لة كتيبى ( فضل العرب والتنبيه على علومها) ،إمام العراقي (محجة القرب في فضل العرب) مرعي الكرمي ( مسبوك الذهب في فضل العرب) (الشيخ بكر أبو زيد ( خصائص جزيرة العرب ) ... پێیان وایە زمانی عربی عەقل بەهیز دەکات، بە واجبیش هەژمارکردوە لە ریزی فیرکردنی قورئان وسونە ، ئیبن تەیمیە دەلێت: (وإنما الطريق الحسن: اعتياد الخطاب بالعربية، حتى يتلقنها الصغار في الدور والمكاتب، فيظهر شعار الإسلام وأهله، ويكون ذلك أسهل على أهل الإسلام في فقه معاني الكتاب والسنة وكلام السلف. بخلاف من اعتاد لغة ثم أراد أن ينتقل إلى أخرى، فإنه يصعب عليه. واعلم أن اعتياد اللغة، يؤثّر في العقل والخُلُق والدّين تأثيراً قوياً بيناً. ويؤثر أيضاً في مشابهة صدر هذه الأمة من الصحابة والتابعين. ومشابهتهم تزيد العقل والدين والخلق. وأيضاً فإن نفس اللغة العربية من الدين، ومعرفتها فرض

---

[1206] ايران تاريخ والحضارة ص53 .

واجب. فإن فهم الكتاب والسنة فرض. ولا يُفهم إلا بفهم اللغة العربية)[1207]، پشتى بە ڕیوایەتیك بەستوە گوایە لە (ح عمر) هاتوە : (تعلموا العربية فإنها من دينكم، وتعلموا الفرائض فإنها من دينكم) ، ئەو فەرمودە بە هیزەش لاواز دەکا (إنَّ الرب واحد، والأبُ واحد، والدَين واحد، وإنَّ العربيةَ ليست لأحدكم بأبٍ ولا أمّ، إنما هي لسانٌ، فمنْ تكلَّمَ بالعربيةِ فهو عربي) ،فەرمودەی ترى لاوازیش بە هێز دەکا (حب العرب إيمان، وبغضهم نفاق )، ئەوانەی ئەو بۆچوونى فقهیەیان هەیە مەزهەبەکانى (..مذهب أحمد وإسحاق بن إبراهيم وعبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور وغيرهم ممن جالسنا وأخذنا عنهم العلم. فكان من قولهم: ونعرف للعرب حقها وفضلها وسابقتها، ونحبهم لحديث رسول الله (ص) ( حب العرب إيمان، وبغضهم نفاق . ولا نقول بقول الشعوبية و أرذال الموالي الذين لا يحبون العرب ولا يقرون لهم بفضلهم، فإن قولهم بدعة و خلاف) گوایە ئەوانە پشتیان بە قسەیەکی (ح عمر)بەستوە کە تیایدا زەمی زمانی عەجەمی دەکا : إيَّاكم وَرَطَانة الأعاجم. ..: "لا تَعَلّموَا رَطَانَةَ الأعاجمِ، ولا تدخلوَا على المشركين في كنائسهم يوَم عيدهم فإن السخطة تنزلُ عليهم".( الرطانة: التي هي التَكلمُ بغير العربيةِ تشبهًا بالأعاجم) ، وقالَ الإمامُ مالك فيما رواه ابنُ القاسم في "المُدونة: لا يُحرِمُ بالأعجمية، ولا يدعو بها، وَلا يحلف. وقال: نهى عمر عن رطانةِ الأعاجم . وسئلَ الإمام أحمد عن الدعاءِ في الصلاة بالفارسية فكرهه، وقال: لِسَانُ سوء. ومذهبهُ أنَ ذلكَ يُبْطِلُ الصلاة. وَكَرِهَ الإمامُ الشافعي لمن يعرف العربيةَ أن يسمي بغيرها، أو أن يتكلم بها خالطاً بالعجمية، وهو ظاهرُ كلامِهِ فيما حكاه عنه ابن عبدِ الحكم ، ( ابن القيم) يش دەلێ «إنما يعرف فضل القرآن من عرف كلام العرب»،لەهەموان مەترسی تر (ئیبن تەیمیە) نەژادی عرب دەهێنیتە ریزی ئاین و هەر دژایەتیەك بە کفر دەزانی : «بغض جنس العرب ومعاداتهم كفر أو سبب لكفر (لأن منهم رسول الله (ص) وعامة أصحابه)، ومقتضاه أنهم أفضل من غيرهم وأن محبتهم سبب قوة الإيمان». أبو منصور الثعالبي المتوفى سنة (430هـ) قال في كتابه محمداً خيرُ الرسل، والإسلام خير الملل، والعرب خير الأمم، .. سەرەنجامى ئەو بۆچونە مەترسیدارانە بەهۆی ئەوەوە جاران زمانی شام بەرەو لای رۆمی وکوردی وعەجەمی بوو ،زمانی میسری قبتی بوو ،زمانی عیراق عەجەمی وفارسی وکوردی بوو

---

[1207] ابن تيمية –اقتضاء الصراط المستقيم ج2 ص207 .

،مەغریب بەربەری بوو ، زۆربەیان بوە عربی ، چەند هەزار عربیك چوونە میسر بەرامبەر نزیكەی 7ملیۆن قبتی ودوای زمانی عربی زال بوو ،ئیستا بووینە كەمایەتی ،ئەوەی دەبوە ئیسلام زمانی عربیشی دەگۆڕی بەهۆی ئەو فتوایانە،لەكاتیكا زمان لە ئەسلی ئاین ولای خودا نیشانەو ئایەتە نابێ بیگۆڕی .

ابن تیمیەبەرەو بەرەیەكی تر دەڕوات پێی وایە عرب زیرەك ترن : (فغلب على العرب القوة العقلية النطقية، واشتق اسمُها من وصفها فقيل: عرب من الإعراب، وهو البيان والإظهار، وذلك خصوصاً القوة النطقية.. ولهذا كانت العرب أفضل الأمم)[1208] ، أبو القاسم محمود الزمخشري (ت538 هـ) لە ئیشەكی كتیبەكەی (المفصل في علم العربية) دەلیَت: (اللهَ أحمدُ على أن جعلني من علماء العربية، وجبلني على الغضب للعرب والعصبية، وأبى لي أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز، وأنضوي إلى لفيف الشعوبية وأنحاز، وعصمني من مذهبهم الذي لم يُجْدِ عليهم إلا الرشقَ بألسنةِ اللاعنينَ، والمَشْقَ بأسِنَّة الطاعنين)... لەوەش مەترسی تر فەزلی عرب بەسەر عەجەم بە كرۆكی سونەو جەماعە دەزانی كەچی پیچەوانەی ئەگەر لەكاردانەوە یەك بلّێ عەجەم فەزل ترە لە عرب دەلێ ئەوە نیفاقە، بابێكی بۆ تەرخان كردوە لە كتیبی(اقتضاء الصراط المستقيم)«باب تفضيل جنس العجم على العرب نفاق) بۆیە دەبینین ئەو كتێبانەی رەدی ئەو بۆچوونە هەلەیان داوەتەوە نەماون بەكوفر هەژماركراوە .

لەكاردانەوەی بۆچونیكی پووچی یەهودیەكان بۆچونی پووچ بەرهەم دێت ، یەهودیەكان دەلین : یەهودیەكان سەرزەنشتی ئیسماعیلی باپیرەی پیغمبەر(محمد دخ) دەكرد كە دایكی جاریە بوە ، شانازیشیان بە ئیسحاق پیغمبەر دەكرد دایكی (ئازاد) بوە ، لیرەش ببینە :

ومن أدلة تفضيل العرب، ما رواه الإمام مسلم في صحيحه أن رسول الله (ص) قال: «إن الله اصطفى كِنَانَةَ من وَلَدِ إسماعيل، واصطفى قريشاً من كنانة، واصطفى من قريشٍ بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم». قال شيخ الإسلام: (هذا يقتضي أنَ إسماعيل وَذريتَهُ صَفْوَةُ وَلَدِ إبراهيمَ، فيقتضي أنهم أفْضَلُ من وَلَدِ إسحاق. ومعلومٌ أنَّ ولد إسحاق -الذين هم بنو إسرائيل- أفضلُ العَجَمِ لما فيهم من

---

[1208] ابن تيمية في - مجموع الفتاوى ج15ص431 .

النبوة والكتاب، فمتى ثبت الفضل لهؤلاء فعلى غيرهم بطريق الأولى. وتدل أيضاً أن نسبة قريش إلى العرب كنسبة العرب إلى الناس. وهكذا جاءت الشريعة كما سنومئ إلى بعضه) ،به پێی ئەو زانیاریانە بێت هاوولاتی پلەیەك ودوو وسێ..لەسەر بنچینەی خزمایەتی ونزیکی بوە ، ئیبن تەیمیە دەلێت:: «وأيضاً فإن عمر بن الخطاب رضي الله عنه لما وضع ديوان العطاء، كتب الناس على قدر أنسابهم. فبدأ بأقربهم نسباً إلى رسول الله (ص)، فلما انقضت العرب ذكر العجم. هكذا كان الديوان على عهد الخلفاء الراشدين وسائر الخلفاء من بني أمية وولد العباس، إلى أن تغير الأمر بعد ذلك)، ئەوە هەمان ترتیبی نەفامی یۆنانیە کە کەمێك لەنەفامی عربی گەشەسەندوو تر بوو ، ڕاستیەکەی لەسەردەمی دادگەری عمر وانەبوە سەردەمی ئەمەوی وابوە ،دابەشی چینایەتی ونەژادیو رەگەزی و خیلەکی دروست بوو ، بۆیە دەبینین لە(مسبوك الذهب، في فضل العرب، وشرف العلم على شرف النسب)-الإمام مرعي بن يوسف الحنبلي الكرمي (1033هـ) نزمی نەژادی ئافرەت دەکاتە پێوەر بۆ تیگەیشتن لە فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم ودەلیت:(أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، كما إن جنس الرجل أفضل من جنس المرأة من حيث الطائفة والعموم) ، ئەوانە دەلێن هۆکاری فەزلی عەرەب ناگەڕێتەوە بۆ ئاین وپیغمبەر ،لەوەوە هیچ پاساوێك بۆ پینە کردن نامینیت جگە لەوەی کە تیۆریکی ڕەگەزپەرستیە،ریشەی دەگەڕێتەوە سەر ئیدیعای شەیتان کە ووتی من فەزلم زیاترە بەسەر ئادەم من لە ئاگرو ئەو لە قوڕ ، لیرەش وادەووترێ : . واعلم أَنَّهُ ليسَ فَضْلُ العَرَبِ ثمَّ قُرَيْشٍ ثُم بني هَاشِمٍ بمجردِ كَوْنِ النبي (ص) مِنْهُمْ كما يُتَوهمُ -وإنْ كانَ هوَ عليه السلام قد زَادَهُمْ فضلاً وشرفاً بلا ريب- بل هُمْ في أَنْفُسِهِمْ أَفْضَلُ وَأشرفُ وأكْمَلُ. وبذلكَ ثَبَتَ لَه عليه السلام أَنَّهُ أفضل نَفْساً وَنَسَباً، وإلا لَلَزِمَ الدَّوْرُ وهو بَاطِلٌ) ،( وليس فضل العرب، ثم قريش، ثم بني هاشم: بمجرد كون النبي صلى الله عليه وسلم منهم - وإن كان هذا من الفضل - بل هم في أنفسهم أفضل، وبذلك يثبت لرسول الله صلى الله عليه وسلم: أنه أفضلُ نفساً ونسباً، وإلا لزم الدور[1209].. گوایە لە( الصحيحين)یش وا هاتوە : الناسُ تَبَعٌ لقريشٍ في هذا الشأن: مُسلمِهُم تبعٌ لمسلمهِم، وكافِرُهُم تبع لكافرهِم.) لەوەش بازدەدا بە ڕوونی دەچیتە سەر فەرهەنگی نەفامی یۆنانی و دەشلێ : (واعلم أن لفظَ الأعراب هوَ في

---

[1209] الاقتضاء..ص148

الأصل اسم لسكان باديةِ العَرَبِ، وإلاَّ فكلُّ أمَّةٍ لها حاضرة وبادية، فباديةُ العَرَب الأعراب، وبادية الروم الأرْمَن، وباديةُ الفُرْس الأكْرَاد، وباديةُ التُرْكِ التركُمَان، فسائر سكان البوادي لهم حكم الأعراب سوَاء دخلوا في لفظِ الأعراب أم لم يدخلوَا. فجنسُ الحاضرة أفضل من جنس البادية).گوايه ئەوه لەوه هاتوه كه بەفەرمودەی لاواز هەژماركراوه : روى الحاكم والبيهقي عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال: قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وصحبه وسلم: لما خلق الله الخلق اختار العرب، ثم اختار من العرب قريشا، ثم اختار من قريش بني هاشم، ثم اختارني من بني هاشم، فأنا خيرة من خيرة )...وأخرج الحاكم في المستدرك والطبراني في المعجم الكبير والأوسط عن ابن عمر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : وخلق الخلق فاختار من الخلق بني آدم، واختار من بني آدم العرب، واختار من العرب مضر، واختار من مضر قريشا، واختار من قريش بني هاشم، واختارني من بني هاشم، فأنا خيار إلى خيار، فمن أحب العرب فبحبي أحبهم، ومن أبغض العرب فببغضي أبغضهم.

لەبارەی ئيمامەت وپيشنويژی ديسان فتوای ڕەگەزپەرستی هەيە لار دەبيتەوه بەرەو تەعريب، (...واحتج أصحاب الشافعي و أحمد بهذا على أن الشرف مما يستحق به التقديم في الصلا.) لەو بارەيەوه ئيمام ابن تيميه ڕايەكەی ڕاست تر دەرچوەو دەڵێ : ( الذي يُقدِّمُ في الصلاة وفي النكاح: كفاءة الدين. وقرر أنه لا يوجد نص صريح عن النبي (ص) فيما قاله سلمان. قال «وكذلك التقديم في إمامة الصلاة بالنسب، لا يقول به أكثر العلماء. وليس فيه نص عن النبي)[1210] .

ئەوه ڕای بەشێكی زۆری فەقيهو ئيمامەكان هەولی تەعريبی ئاين وفقهيان داوه ،لەبەرامبەردا زۆرايەتی فەقيهو ئيمامی تر ڕای پيچەوانەيان هەبوه كه لەگەل ناوەڕۆكی ئاينی سازاوه،ئەوانه زياتر بووينه بەلام دەسەلاتی حوكمدار ئەوانی تری هێناوەته مەيدان ، ئەو بەشەی كه لەگەليان نەبووينه تووشی توومەت وسزا بووينه ، لەوانەی دژی ئەو جۆره بۆچوونه فقهيانه بووينه (القاضي أبي بكر بن الطيب) پشتی بەستوه به ئايەت وفەرموده: (إنّ الله عزّ وجلّ أذهب عنكم عُبيَّة الجاهلية وفخرها بالآباء، مؤمن تقي وفاجر شقي. أنتم بنو آدم وآدم من تراب. ليدعنّ رجال فخرهم بأقوام، إنما هم فحم

---

[1210] مجموع الفتاوى ج19ص26 .

من فحم جهنّم، أو ليكوننّ أهون على الله من الجعلان التي تدفع بآنفها النتن). أخرجه أبو داود والترمذي، ئەوەیان ڕێکە لەگەل دەقی ئایەت وفەرمودە کەچی ڕایە چەوتەکە بە ئاسانی کاریگەری گەیشتۆتە ئەو سەردەمە،لە (معجم المناهى )واهاتوە: (وما زال السلف يكرهون تغيير شعائر العرب حتى في المعاملات ، وهو « التكلم بغير العربية » إلا لحاجة ، كما نص على ذلك مالك والشافعي وأحمد " بل قال مالك : من تكلم في مسجدنا بغير العربية أُخرج منه ، مع أن سائر الألسن يجوز النطق بها لأصحابها " ولكن سوغوها للحاجة ، وكرهوها لغير الحاجة ، ولحفظ شعائر الإسلام " فإن الله أنزل كتاب باللسان العربي ، وبعث به نبيه العربي ، وجعل الأُمة العربية خير الأُمم)[1211] ،هەروەها زانایەکی وەك (ابراهيم نعمه لە کتێبێکی —لغتنا والمؤامرة) هەلدەچێ ودەلێ : (فضل اللغة العربية على اللغات كفضل القمر ليلة البدر على الكواكب) ، دووبارەی ئەو بۆچوونانەی کردۆتەوە ، ئەوەی دلنیاین کە ئەو بۆچوونە فقهیانە جیکەوتیکی ئاینیٖ استەقینەی نیە بە نەفامی باسی (فەزلی مانگی بەسەر ئەستیرە )کردوە کە لەڕووی سەرەتاکانی لۆجیکی هەلەی زانستی تیدایە هیچ ئەستیرەیەك نیە لەو گەردوونە چەندین جار لە مانگ گەورەتر نەبێت .

**تەعریب لە فقهی زەواج** : وەك ڕوونە بەفەرمودە سیستەمی هاوسەری دیاری کراوەو لە نێوان کۆمەلێ پالنەری نەسەب وسامان وجوانی و.. ئاینداری هەلبژاردوەو نەسەب وئەوانی تری ڕەتکردۆتەوە ،،کەچی کۆمەلێك فەقیهو ئیمام دێن پیچەوانەی ئەسلی ئاینی وڕێنمایی پیغمبەر (د خ) سیستەمێکی نەفامی تەعریبکراو دادەڕژن .

لەسەر ئەوبنچینەیە هاوسەری قەدەغە کراوە لە نێوان عرب وغەیرە عرب ،(روى ابن أبي شيبة (2|336) وكذلك الطبري في تهذيب الآثار، أن جماعة من الصحابة قالوا لسلمان الفارسي (ر): «صل بنا يا أبا عبد الله أنت أحقنا بذلك». فقال: «لا أنتم بنو إسماعيل الأئمة ونحن الوزراء». صححه الألباني في الإرواء. وروي عن سلمان قوله: «اثِنْتَانَ فَضَلْتُمُونَا بِهَا يَا مَعْشَرَ الْعَرَبِ لاَ نَنْكِحُ نِسَاءَكُمْ وَلاَ نَؤُمُّكُمْ». وفى روايه: «إنا لا نؤمكم ولا ننكح نساءكم. إن الله هدانا بكم». ليرەدا بە

---

[1211] معجـــم المناهي اللفظية(ويليه فوائد في الألفاظ )- بكر بن عبد الله أبو زيد ص16-17.

ڕوونی دەردەکەوێ کە ژن هێنان لە عرب ماناجاهلیەکەی عربی وخێڵەکیە کە زاوا تاوانە ،سەرکەوتن بۆ ئەو خێڵە کە پیاو لەوان بێت وژن لە وانی تر،بۆیە ژنیان نەدەدا بیگانە ، مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدو شافعی ئەو بۆچوونەیان لەوانی تر زیاتر هەیە تاڕادەی لێکجیاکردنەوە ، ئیبن تەیمیە بە توندی پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکاو دەڵێ : «إسناده جيد. وهذا مما احتج به الفقهاء الذين جعلوا العربية من الكفاءة بالنسبة إلى الأعجمي، واحتج به أحمد في إحدى الروايتين على أن الكفاءة ليست حقاً لواحد معين، بل هي من الحقوق المطلقة في النكاح، حتى أنه يفرق بينهما عند عدمهما))، لە کتێبی(مسبوك الذهب فی فضل العرب) بە فەرمووده یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەکا، لەمەزهەبی ئیمامی شافعیش لە بابی زەواج بەشی(کفاءة)هەمان ڕای هەیە،چەندین مەزهەبی تریش ئەو دەردەیان هەیە،شيخ الإسلام ابن تيميه دەڵی : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهم)[1212] ،ئیبن تەیمیە زیاتر ڕەتیدەداو بەوانە دەڵیت گێل کە پێیان وایە عرب لە هەمو میلەتیکی تر زیرەك تر نەبێت[1213] ،هەروەها دەڵێت: (... كما أن جنس العرب يستحق من المحبة والموالاة ما لا يستحق سائر اجناس بنی ادم..)[1214] ، لەکتێبی ( المعرفه والتاريخ) سەربردەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەگێڕیتەوە ، کە تیایدا چۆن زانایەکی کوردی نەوەی بن سیرین هاوسەری لەگەڵ ژنە عربیك کردوە چیان بەسەر هێناوە ،لەکاتیکا چوار مەرجەکەی هاوسەری لە فەرمودە وەك نەخشە ڕێگا دیاری کراوە زۆر جیایە لەگەڵ ئەو سزایەی ئەو هاوسەریەی کوردیك وعربیك دراوە ،دەقەکەی بە عربی: ( تزوج بن سيرين عربية وكره الموالي لما يدخلهم من السبي. قَال : فذهب بن عون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه وفرق بينهما ، قال له : طلقها. قَال : هي طالق. قَال : ثلاثًا قَال : واحدة تبتها. قَال : أقول له ثلاثًا وهو يبتها. وقال له : طلقها. قَال : هي

---

[1212] اقتضاء الصراطالمستقيم ج1ص419 .

[1213] شيخ الاسلام ابن تيمية – درء التعارض ..ج3ص37

[1214] منهاج السنة النبوية ج4ص276

طالق ثلاثًا. قَال : واحدة. قَال : أقول له ثلاثًا وهو يفتيني بطلاقها)[1215]، ئەوانە هەموی دژی دەقی ئاینی قورئان وفەرمودەیە ، دەشلێن عەرەب عاقل ترن وکوردو عەجەم دەبێ لە خزمەتیان بن.

** ** ** **

بەو شێوەیە دەکرێ بلێین تەعریب هەبوە، بەلاَم بەمەبەستی (پاکتاوی ڕگەزی)نەبوە،بەو مانایەی سەردەم عەرەب بهێنن لە شوینی کورد دابینێن، ئەوە نەبوو ،جگە لەیەك نمونە لە موسل کراوە لەسەر دەستی موعتەسەم (دوای باسی دەکەین)،لە سەر بنچینەی هەلەی فقهی هاتوە بۆیە زۆر جارعەجەم وکوردو خەلکی تریش یارمەتیدەری تەعریبی بوینە ،سەرەڕای ئەوەش یەکێ لە ڕەهەندەکانی تەعریب پێك دەهێنێت، بەلام جاریش وایە پیچەوانەش کراوە ، هەندێ جار تەکرید دژ بەعەرەب وخەلکی تر هەبوە ، هەروەك (تۆماس بوا) لە(تأريخ الأكراد) و راپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصلێ ص148) زۆرسەرچاوەی تر هاتوە: تورك و عەرەب وڕەگەزەکانی ترهاتوونە لەناوکورد تواینەوە[1216]، لە ڕاپۆرتەکانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا کە لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو کورد تواینەوە[1217] ، هەمان ڕاستی لە بەلگەنامەی بریتانی وەزارەتی دەرەوە ( CO 730/ 161/2) دەردەکەوێ.

جاریش وایە تەشەیوع هەبوە دژی عەرەبی سونە، لەسەردەمێك کە دەولەتی عوسمانی دژایەتی شیعەی کردوەو یارمەتی سونەی داوەو خۆی سونە بوە ،تەنانەت دانیشی بە مەزهەبی شیعەو دام ودەزگائاینیەکانی ئەوانی نەکردوە ، وادیارە تەشەیوعەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعەکان پابەندی ئاینیان بە مەرجەعیەت ومامۆستایانی ئاینی زۆر هەبوە ،ئەوپەیوەندیە لە کۆمەلگەی سونی عەرەب زۆر لاواز بوە ،هەتا لە قۆناغی بەدەوی بوون ئەوا هەندێ بەهای بەدەوی هەبوو بۆیان کۆمەلگەکەیانی ڕاگرتبوو ،کەچی کە پیشکەوتنیك لە (بەدەویەوە)بۆ شارستانی ڕوویدەدا دەکەوتنەبۆشاییەکی ئاینی

---

[1215] أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوي– المعرفة والتاريخ – ، المحقق : د أكرم ضياء العُمَري ج2 ص63

[1216] (تؤماس بوا– تأريخ الأكراد ص197

[1217] تقرير المفتش العام الأول – FO. 371/12255 ..،و الصنف الثاني هم الأتراك الذين حسب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا..

وشیعەگەری ئامادەبوو بۆیان ،لەسەر ئەو بنچینەیە والی بەغدا(محمد نامق پاشا) بە نوسراوی فەرمی داوا لە دەولەتی عوسمانی دەکا هەندێ زانای ئاینی بۆناوچە سونیەکان بنێرن[1218] ،لەشوێنی تر بۆیان هێنان هەر چارەیەکی وای نەبوو چونکە لە ناوەخۆ ئەو مەلایانەیان نەبوە ،لە راپۆرتیکی بابی عالی عوسمانی بەناوی سولتان لە 1891/3/24 هۆکاری تەشەیوع دەدەنە پال ئەو هەمو یارمەتیەی بۆ مەرجەعە شیعەکان دێت بەناوی (ئۆدە) کەلە ئیران وهندەوە دەهات .

**کاریگەری (تەعریبی فقهی) لەسەر کوردستان:** فقه ئەو ڕۆلەی نەبوە لەتەعریب، ئەگەرهەبوایە ئەوا تەکرید نەدەبوو وەك لە سەروو ولەخوارووش باسی دەکەین ،سێ هۆکار هەبوو وای کرد ئەو ئاڕستە فقهیە کاریگەریەکی وای نەبێت لە تەعریبی کوردستان ، یەکەمیان ئەسلی ئاینەکە تەعریبی تیدا نەبوە ،دوەم پالنەری نەتەوەیی تێدا نەبوە ، یان ووردتر ئەوکاتی سەردەمی نەتەوەیی نەبوە ،سێیەم کەمتر عەرەب دەسەلاتدار بووینە ،کوردلەسەر خاکی خۆیی وبگرە زیاتریش دەسەلاتی هەبوە ،دەسەلاتی خەلافەتەکانی خەریکی نەتەوەیی نەبووینە ،نمونەیەك هەیە کە پیچەوانەی ئەو بۆچوونەی ئێمەیە لێرە باسی دەکەین ، هەریەکە لە ابن خلدون( 1406)م وابن اثیر(1160- 1233)م دەلێن لە سەردەمی (خەلیفە معتصم)کوردەکان دەستیان بەسەر موسل داگرت ،دوای بەزەحمەت شکاندنیان موعتەسەم بیری لەوە کردەوە کە خەلکی عەرەبی لایەنگری خۆی بهێنیتە موسل،بەو شێوەیە یەکەم تەعریبی موسل لێرەوە کرا، هەروەها فەرمانیش بە حەجاج کراوە کورد قڕ بکەن [1219]، ئەوانە بوە بەلام بە سەرنجیکی فراوان تر دەردەکەوێ بەمانای تەعریب نەبوە بەمانای دەسەلات پاریزی بوە ،چونکە ئەو سزایە بۆ باوەڕدارو بنەمالەی پیغمبەرو عرب وعجم هەبوە .

ئەدی ئیستا رەهەندی تەعریب هەیە لەو پرۆسە تەعریبەی ئیستای کوردستان؟ عەلمانیەتی ناشیۆنالیزمی عەرەبی بە ڕاشکاوانە تەقەلای تاوانەوەی میلەتانی تری ژێردەستی عربی هەلگرتوە (کورد- قبتی-ئەمازیغ-بەربەر- عەلەوی -تورکمان--زەیدی-شیعە) ئەو هیزو دەولەت بەکاردێنێت

---

[1218] سعد سلوم-السیاسات والاثنیات فی العراق(منذ الحکم العثمانی حتی الوقت الراهن) ص62 .

[1219]لە (بدایە و نهایە ج16) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکا لەسەردەمی ئەمەوی:..وفیها استعمل الحجاج علی فارس محمد بن القاسم الثقفي، وأمره بقتل الاکراد.

،کاریگەریەکەی لە چوارچیوەی داگیرکاری ڕەت نابێ ،بەلام تەقەلا بەناوی ئاینی مەترسی هەیە ئەو کارلیکە لە بناغە فەرهەنگیەکان ڕووبدا ،بەناوی فەزلی عەرەب وخۆشەویستیان چ چاك بن چ خراپ،ڕق لیبونەوەیان حرام بێت ئەگەر داگیرکاریش بێت ، یان گۆتەی :هەرچی لەوولاتانی عربی دەژی عەرەبە ،تەنانەت هەندێ زانای عربی دەلێن هەرچی نویژی بە عربی بکا عرب هەژمار دەکریت (لەوانەش زانای گەورە د یوسف قرزاوی) ...،

تەنانەت تەقەلایەکی تری مەتسیدار دراوە ئەو جارە لەلایەن فقهی میژوویی ،هەندێ فەقیهو میژوونوس هەولیان داوە سەرجەلەی کورد(انساب الاكراد) بگیڕنەوە سەر عەرەب، نسبی کورد گوایە عربە، کەچی  ئاسان دەردەکەوێ ڕەچەلەکی کورد ئاریە نەك سامی،وەلامەکەی لای ئیبن خەلدوونە ،میژووی زۆر قوولە ابن خلدوون بۆ نزيك ح نوح دەباتەوەو دەلێ:( ...وقال ابن سعيد كان لأشوذ أربعة من الولد: إيران ونَبيط وجرموق وباسل. فمن إيران الفرس والكرد والخزر، ومن نبيط النبط والسريان، ومن جرموق الجرامقة وأهل الموصل، ومن باسل الديلم وأهل الجبل)[1220].

ئەگەرچی هەمو ئەو کاریگەریانە نەگەیشتە تەعریبی ڕەگەزی کورد بەلام توانیان فەرهەنگ وکەلتوری عربی وئاینی تیکەل بکەن وبەو تێکەلیە فکری بەشی زۆری ئاینپەروەری کورد داگیر بکات ، ئەو کاریگەریە زۆر زیاتر کەوتە سەر هەندێ میلەت کە مقەوەماتی ڕەگەزی بەهێز نەبوە ،شام وسەرووی ئەفریقا دووچاری ئەو توانەوە بوون ، تا ئیستاش لە تویژینەوەی ڕەچەلەك شام بۆ عرب دەگاتە ڕێژەی 33٪ بە پێی پشکنینی (<u>هاپلوگروب جی</u>)کە تایبەتە بە عرب ، بەو شێوەیە سوریاو وئوردەن ولبنان بۆ ڕەگەزی عرب ساغ بوویەوە ، خوارووی عیراقیش بەو شێوەیەوەرچەرخا ، بە پێی هەندێ سەرچاوە ئەو پرۆسەیە لە سەدەی 7 ەوە دەستی پیکردوە  وەك لە (Encyclopædia Britannica ) لە سەدەی 7 تەعریبیك ناوەڕاست وخوارووی عیراقی ئیستا بۆ عرب یەکلا کردەوە کە پیشووتر کوردو عەرەب وعەجەمی لیبوو[1221]، ئەو بەرەنجامە میژوویە بەرجەستە کراوە لە دەستوری عیراق وسوریای، سەیری

---

[1220] تاريخ ابن خلدون ج2ص10 .

[1221] Encyclopædia Britannica -Article :Iraq

دەستوری عێراق1968 بکەو ودوایش هەردووبارە دەبۆوە : المادة الأولى: ..الشعب العراقي جزء من الأمة العربية ...، دةستوری سوریاش1970و 1973: المادة الأولى فقرة(2)- القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي. .لەو دەستورە (51) جار ووشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەك جاریش ناوی کوردی تیا نەهاتوە .

ئەو تەعریبە نەگەیشتە کوردستان ئەو کاتی ،هەروەکو بەلگەنامەیەکی بریتانی ( CO 730/ 161/2) باس لەو دۆخە وادەکات: ....ينطق الكرد باللغة الكردية التي تعود الى اللغات الارية ولا تربطها شيء بالعربية ذات الاصل السامي. بينما استطاع العرب ان يفرضوا لغتهم على الشعوب الغير العربية في سوريا ومصر ومناطق اخرى فلم يستطيعوا ذللك في كردستان حيث لا زال الكرد يتكلم بلغته الاصلية... ، ئەو جۆرە بۆچونەی فەزلی عەرەب بۆ خۆی وبۆ میلەتانی تر دەردەسەری بوە ،ئیستاش دەردەسەریە ،کاریگەری لە میللەتە لاوازەکان کرد وەك لەسەروو باس کرا،کوردستان بەهۆی سەردەستەیی وبەرگەی بەهێزی نەتوایەوە تا لە کۆتایی سەدەی 19 بەرەبەرە لاواز کرا، لە خوارووی عیراق و دەوروبەر بچوك کرایەوە ، بۆیە دەبینین لەدوای ئەومێژوە نەخشەی کوردستان ئیستا نیوەی نەخشە ڕەسەنەکەی خۆیتی ، هەتا ئەگەر بەبەراورد لەگەل ئەو نەخشەیەی لە سیڤەر1920 (مادەی 62ی بەشی شێیەم) و نەخشەی ئیداری عوسمانی 1893 ، لەو دواییەش بەرەبەرەکەرکوك وموسل و سنوری خوارووی کوردستان ژمارەی دانیشتوانی کوردی لێ کەم دەبێتەوە تەعریبی مۆدێرنی لێکاریگەر دەبێت، لە بەرامبەردا عەرەب زیاد دەکا ،لە پێش ئەوبەرواره لەگەڕیدەو نەخشەوئامارەکان بە حاستەم باسێکی بوونی کەمی عەرەب وتورکمان کراوە،کەچی بۆیەکەم جارلەلایەن(ئۆلیڤەر-1809) لەسەردانەکەی بۆموسل دەڵێت: موسل25000 عەرەب، 16000کورد، 16000تورکمان،8000 مسیحی،1000یەهودی لێیە[1222] .

---

[1222] تقرير ولايه موصل ص109 لە کتیبی(مشکله موصل- .. ص 95) کوردی کردۆتە 17000 وتورکمانی کردۆتە 11000 . (**بۆ ئاگاداری** : ئەو راپۆرتەی ویلایەتی موسل کە لەبەردەست ئێمەیە کەمێك لەگەل ئەسلیەکە لە لاپەڕەکان جیایە دەقەکەی ئەوەیە_ولاية الموصل-تقرير لجنة عصبة الامم الخاصة بحل النزاع التركى البريطانى حول ولاية الموصل-مراجعة والتحقيق:عبدالرزاق محمود القيسى)

تەیاری عروبی هاوچەرخ سودی زۆری لەو فقهە سەقەتە وەربگرتوە،تا ڕادەیەك توانیویانە(فکری قومی) دەوڵەمەند بکەن بەوەی کە نەتەوەی عەرەب پەیامی ئیسلامی بۆ هەموو نەتەوەکانی تر هەڵگرتووە، وەك شبلی عیسمی دەڵێ: (أحياناً العروبة أوسع من الإسلام)[1223].

ئەو زاراوانەی پیشوو بە جۆری سەردەمیانە زیندوو کرانەوە لەوانە (شعوبی وموالی وعلوج و..)، لە بنەچەدا شعوبی لەناو خیلەکانی عرب هەبوە ،چەند پلەیەك هەبوە لە (فصیل) دەستی پیکردوە دوای(فخذ)-بطن-عمارة-قبیلة –شعب چەند قەبیلەیەك پێی ووتراوە (شعب) ،وەك کوردیش وایە بنەماڵە –بەرە-خیل ئینجا نەتەوە ...وەك زاراوە دەگەڕیتەوە بۆ سەردەمی عباسی ، ئەو تەیارە جاهلیە بەپێی فەرمودەکەی پیغمبەر بەرامبەر (ابوذر الغفاری)..فيك الجاهلية ، بەوانە ووتراوە کە عربیان بەسەر عجم فەزل نەکردوەو دژ وەستان دوایش هەمو ئەو زانایانەشی گرتەوە کە عرب بەسەر میلەتانی تر فەزل ناکەن .

لەبەرامبەر ئەو بۆچوونانەی فەزلی عرب لە زۆر لایەن فەزلی میلەتانی تر بەسەر عرب نوسرایەوە هەر لە ئەندەلوس تا دەگاتە عەجەمستان ،لەوانە :کتیبی (انتصاف العجم من العرب-حميدالبختكان) (فضل العجم على العربةافتخارها) (مفاخر العجم) ..بەلام ئەو کتیبانە لە نیو براون تەنها لەلایەن جاحزوابن قتیبە (عيون الاخبار)هەندیکی نەقل کردوون، بە پیی (الموسوعه العربيه) بۆیە لەناوچوون چونکە هۆکاری پەرتەوازەی ئومەی ئیسلامی بوە[1224] کەچی کتیبەکانی فەزلی عرب ماون ، لەوەش مەترسی تر فەزلی عرب بەسەر عجم بە کرۆکی سونەو جەماعە دەزانی کەچی پیچەوانەی ئەگەر لەکاردانەوە یەك بڵێ عەجەم فەزل ترە لە عرب دەڵێ ئەوە نیفاقە، بابیکی بۆ تەرخان کردوە لە کتیبی(اقتضاء الصراط المستقيم)«باب تفضيل جنس العجم على العرب نفاق) ، إلى أن لا فضل لجنس العرب على جنس العجم ـ وهؤلاء يسمون الشعوبية ، ومن الناس من قد يفضِّلُ بعض أنواع العجم على العرب، علَّق على ذلك بقوله رحمه الله: (والغالب أن مثل هذا الكلام لا يصدر إلا عن نوع نفاق:

---

[1223] شبلی عیسمی-العلمانية والدولة الدينية ص213 .

[1224] الموسوعه العربيه ج11ص717

إما في الإعتقاد، وإما في العمل المنبعث عن هوى النفس، مع شبهات اقتضت ذلك)[1225]، (ولا نقول بقول الشعوبية و أرذال الموالي الذين لا يحبون العرب ولا يقرون لهم بفضلهم، فإن قولهم بدعة و خلاف) ، خراترلەوەش: أبو القاسم محمود الزمخشري (ت538 هـ) قال في مقدمة كتابه "المفصل في علم العربية": «اللهَ أحمدُ على أن جعلني من علماء العربية، وجبلني على الغضب للعرب والعصبية، وأبى لي أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز، وأنضوي إلى لفيف الشعوبية وأنحاز، وعصمني من مذهبهم الذي لم يُجْدِ عليهم إلا الرشقَ بألسنةِ اللاعنينَ، والمَشْقَ بأسِنَّة الطاعنين) پیویستە قسە بە عربی بکریت بۆ عەقل باش ترە بە واجبیش هەژمارکردوە لە ریزی فیرکردنی قورئان وسونە و دەلیٚ منداليش فيربكرين .

واپيدەچی(زاراوەی شعوبی)لە فەرهەنگی یەهودی هاتبیت،نزیکە لە (امی کە لەفەرهەنگیان سەرزەنشت وغەیرە یەهودە) بەو زاناو عاقلمەندانە ووتراوە کە باوەڕیان بەوە نەبوە هیچ میلەتیك لە میلەتیکی تر وهیچ کەس لە کەسیکی تر فەزلی زیاتر بیٚت بە هۆی ڕەگەز ،ئەو ئاڕستەیە بوە تومەت لەلایەن شۆڤینی عربی سیاسی وفقهی ،لە کاردانەوە بەشیکیان بوونە بزوتنەوەیەکی پیچەوانەی فەزلی عەجەم بەسەر عەرەب، دەلیٚن ئەوە بەفیتی یەهودی عەجەم بوە ، ولەهەرەدوای بوە فەزل بەسەر سامی وبزوتنەوەی (ئەنتی سامی) لیٚپەیدا بوو وبوە هۆی جینۆسایدو هۆلۆکۆستی یەهودی لە ئەوروپا ،یەهودیەکان سەرزەنشتی ئیسماعیلی باپیرەی پیغمبەریان دەکرد کە دایکی جاریە بوە ، شانازیشیان بە ئیسحاق پیغمبەر دەکرد دایکی (ئازاد) بوە .

تەعریبی کوردستان:

---

[1225] الاقتضاء: 149.

تەعریب هەر پرۆسەو بڕیاڕی شۆڤینی عەرەبی دەسەلات نیە ،بەلکو پالپشتە بە ئەدەبیاتی زۆربەی ڕەوشەنبیرانی عەرەبیش ، ئەمین رەیحانی هاتنی کوردوعەجەم بۆ بەغداو ناوچەکە بە (نکبە الرابعە ) وەسف کردوە[1226]، لەکاتێکا کوردلەدوای (ح نوح)لەوناوچەیە بووینەو عرب وتورکی لینەبوە .

لەوانەی سەروو دەرکەوت تەعریب میژوەکی هەیە بەلام تا نەگەیشتە تەعریبی عەلمانی کاریگەریەکەی بەو شێوەیەی ئیستا زۆر نەبوو ، ئیستا تەعریب هەر زاراوەو چەمکێکی توومەت وتیۆر نیە ،بەلکو بەشێك بوە لە چالاکی حزبی وحکومی ،بڕیارو یاسای بۆ دەرچوە ،خودی حکومەتی عیراق لەسەردەمی حزبی بەعس (نەك لەدوای کەوتنی) دانی بە بوونی تەعریب هێناوە.

پرۆسەکە بە ڕاستەوخۆیی لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم و هەلوەشاندنەوەی خلافەتی ئیسلام دێت، یەکەم نەخشەی تەعریب دژ بە کوردستانی خواروو بریتی بوو لە جیاکردنەوەی کەرکوك ناوچەکانی دەوروبەری لە کوردستان بە پێی نەخشەی سایکس —پیکۆ 1916 بوو ئەو ناوچەی ناو نا (B)[1227]، یەکەم تەقەلای تەعریبیش ئینگلیز کردی لە کیشەی ویلایەتی موسل لە دوای 1923[1228]،تەتریکیش بە پێی (توماس بوا) یەکەم جار (انور پاشا) کردوویەتی[1229]، ئەو تەعریبەی لەلایەن بەریتانیا کرا ویستی شێوازێکی عەرەبی بداتە ویلایەتی موسڵ لەکاتی کێشەکەی ئەو ویلایەتە لە 1923- 1925 ، لە دوای دروست بوونی عێراق لە 1921 بە ناسنامەیەکی عربی لەلایەن بریتانیاوە ئۆتۆماتیکی دەستی پێکرد، هەر خودی دروست کردنی عیراق تەعریب بوو ، هەر ناویشی وولاتیکی عربی نرا ، یەکەم جار لەناوچەکانی کەرکوك تا موسڵ پرۆسەی تەعریب

---

[1226] امین الریحانی —قلب العراق رحلات والتاریخ - مؤسسة الهنداوی ،القاهرة ص23 .

[1227] بڕوانە نەخشەی سایکس پیکۆ .

[1228] بە ووردی بڕوانە ڕاپۆرتی لیژنەی(عصبە الامم) چۆن بریتانیا ئەو تەقەلایەی داوە .

[1229] توماس بوا - تأریخ الاکراد ص193.

بەناڕاستەوخۆدەستی پێکردلەحکومەتی(یاسین هاشمی)[1230]یەوە تا 1963، لەدوای ئینقلابی حزبی بەعس لە 1963 و 1968 بە ڕاستەوخۆ و بەرنامەڕێژی دەستی پێکرد .

لە بەلگەنامەیەکی بریتانی سالی 1938 وا بەدی دەکرێ کە کورد بۆ یەکەم جار لە سەر ئاستی میللی هەست بەتەعریبی کەرکوك وتەقەلای سامان بردنی کوردبکەن ، لەو بەلگەنامەیە fo.370/671,secret-ref.c/s/3سلیمانیە- 1938/4/6 مۆری (ولسون)ی پێوەیە دەلێت لەناو خەلك دروشمی ((نەوتی کەرکوك مولکی کوردە)) بلاوبوویتەوە، هەروەها دەلێن ((لا الجمل حیوان ولا العرب إنسان))...واتە قین لە عربیش دروست بوە کە پێشوو تر عەرەب لەناو کورد زۆر خۆشەویست بوە، واتە تەعریب هەست پێکراوە لەسەر ئاستی میلیش ،ئیتر دوای ئەوانەش لە هەر ئامارێك بۆ ئامارێکی تر ژمارەی کورد کەم دەکا هەربە نمونە: لە نێوان هەردووئاماری 1957 و1977عەرەب لە(2 ,28٪بەرز بۆوە بۆ(44,4 ٪) هەرچی کوردە ڕێژەی کەم بۆوەلە (48,3 ٪) بۆ(37,6 ٪).

یەکەم بەلگەنامەی فەرمی کە ئاماژە بە تەقەلای تەعریبی شاری کەرکوك ودەوروبەری دەدالەدوای سالێك لەئینقلابی1958لەلایەن(ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش)،نوسراوی ژ: س/ 142لە سەرکردایەتی فق2 -استخبارات لە1959/1/19بۆ سەرۆکی ئەرکان دەنێرن بەناوی (الحالة السیاسیة فی المنطقة المسؤلیة فق2) دەلێن: (سەرکردایەتی شۆرش بڕیاڕی داوە دوو ئەفسەری بەهێز بۆ کەرکوك بهێنی (عبدالجلیل الحدیثی محافظ الکرکوك و وناظم طبقجی قائدا للفرقة) چونکە ئەو ناوچەیە زیاتر کوردن، لەسەر دەستی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عیراق،تا گەیشتە 1963 ی ئینقلابی بەعس توند بوو،دوای نەمانی بەعس هێور بۆوە، ،لەدوای 1968 کە بەعسیەکان دەسەلات دەگرنەوە دەست تەعریب بە نەخشەو پلان ومەترسیدار دەست پێدەکاتەوە ،تەعریب بوە فەرمی ، ئەوە پەیڕەو کرا لە عیراقیك گوایە هەردوولا هاوولاتی وشریکن، ئەو تەعریبەبووە هۆی گۆڕینی نەخشەی دیمۆگرافی ناوچەکەو جێگیر نەبونەوەی تا ئەو ساتەش، ئینجا ناوی ناوچەو شار و

---

[1230]بۆیەش بکرسدقی کورد بیری لە ئینقلاب کردو پەیرەوی کرد لە 1936-بڕوانەیاداشتەکانی مەندوبی ئەلمانیا لەعیراق فریتز غروبا لە (العراق فی المذکرات الدبلوماسین الأجانب ) .

گوندەکانیشی لە کوردیەوە کردە عەرەبی، لە هەموان ترسناك تربە بڕیاڕی (مجلس قيادة الثورة) ژ:41 لە29/ کانونی دوەم/1976ناوی کەرکوکی گۆڕی بۆ تەئمیم[1231]،ئینجا دەولەت خۆی بە فەرمی بەتەعریب هەلساوە بەو شێوەیەی خوارەوە:

أ- مرسوم الجمهوري- بە مۆری احمد حسن البكر ژ:608-1975/12/15 هەردوو شارۆچکەی چمچمال وکەلاری لە کەرکوك داڕنی وخستیە سەر سلێمانی . لە مەرسومێکی تری بە ژ:33 لە25/کانونی دوەم/1976تیایدا کۆمەلێك گۆرانکاری ئیداری ورەگەزی لە کەندیناوەوقراج دەکات، هەروەها بە پێی بڕیاڕی ژ:55(محافقه التأميم) لە1976/3/2 ناوی گوندو شارۆچکەکانی ئەوناوچەیە بگۆڕدرێت لە کوردی بۆ عەرەبی ،لەوانە:زندانە بۆالنصر ،یارمجە بۆ جدە،تۆغماغلو بۆالخنسا...هتد ، ئەو کاتی شۆرشی کوردیش نەمابوو تا بلێین ئەوە بە هۆی نا ئارامی بوو.

ب-مجلس قيادة الثورة ژ:160-3/29/ 1987بە بڕیاڕی هەردوو (القيادة القطرية والقومية) علی حسن المجيد بکرێتە حاکمی موتلەقی کوردستان[1232].

پلانێکی تەعریب بە فەرمی داڕژرا لە 1993/4/5 بە پێی بریاری ژ:87/11/3 بەناوی (لجنە الشمال) پێك هاتبوو لە :(مزبان خضر هادی ،نوری فیصل شاهر،خضر عبدالعزيز الدوری،مزهرالعواد،وزير الداخلية،مدير جهاز المخابرات،مدير الامن العام،مدير استخبارات العسكرية) هەمو ئەوانە بە سەرۆکایەتی طه یاسین رمظان ، 5مادەی تیادا هاتوە، یەکەم داکۆکی موتلەق لە عروبەی کەرکوك بەهۆی پڕکردنی لە عەرەب دەکا.پالپشت بەو بڕیاڕە بەمۆری طه یاسین رمظان-ژ:20/85-1997/1/20بڕیارماندا لە جێی کوردەکان میسریەکان تەعین بکەین ..

ت- لەبارەی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی- گۆڕینی ئەو دۆخە نەریتیاویەی کە لەسەردەمی عوسمانی بۆ عرب بەسلبی ماوەتەوە چا بکرێت وزاراوەی هاوتای (دار الإسلام )لابرێت نازناوی خاکی

---

[1231]ئەو بڕیارە لە 1969 دەرچووبوو بەلام ئەو کاتی باری جێبەجێ کردنی ئامادە نەبوو.

[1232]ئەو هەنگاوە وێچووی بڕیاڕی (هیتلەر)بوو، کاتێ لەگەرمەی بەرگری میللەتانی ژێر دەستە لە سالی 1943 (راینهارت هیدریچ)ی سەرۆکی (جستاپۆ-هەوالگری) دەستوری موتلەقی پێدا بۆ پاکتاوی رەگەزی هەرێمی(باڤاریا)و لێدانی شۆرشگێران، ناوی بە (جەلاد)رۆیشت.

عربی پێبدرێت-مجلس قیادة الثورة –رقمالقرار:199 9/6/ 2001 ئەوەی لەسەر خاکی عەرەب دەژی بە عرب هەژمار دەکرێت ، بەو پێیە لە بڕیارێکی تریان بەژ:21/34 کە پێشوو تر لە1998/4/5دەرچووبوو جێبە جیّ بکرێت: هەرکوردێك یان کەمایەتی تری نەتەوەیی خۆیان بۆ عەرەب گۆڕی ئەوا هەمو مافەکانی دەگەڕێتەوە لەو شارە وەك عەرەب ،ئەوەی ناسنامەشی ڕاست نەکردەوە ئەوا یەکسەر دەگوازرێتەوە بۆ شارەکانی خواروو. ئەوە لەکاتێکا بڕیارێکی تر دەرچوو لە (مجلس قیادة الثورة- بە مۆری صدام حسین ژ:850 لە1988/11/27 4 مادەیە، لە یەکەما دەڵێت:بە هیچ جۆرێك نابیّ عەرەب ناسنامەی نەتەوەیەی بۆ نەتەوەوڕەگەزێکی تر بگۆڕیّ وهیچ پاساو هۆیەك وەرناگیریّ،بەلای کەمی سالێك زیندانی دەکریّ .

پ- مجلس قیادة الثورة–رقم:632 1989/10/7 بە مۆری صام حسین تیایدا هاتوە کە قوتابی بە هۆی زمانی کوردی ناکەویّ.

(39)

## قەیرانی عەقلی عەرەبی ازمەعقل العربی the Arab mind Crisis

**ئەوانەش دەگریتەوە (جهل مرکب، شعوبی ، موالی ، نەخۆشی عەقلی ،معدل الذکاء..)**

ئەو زاراوەیە ڕیشەیەکی کۆنی هەیە بەلام بەو سەردێرە نەهاتوە، لە کۆتایی سەدەی بیستەم جاریکی تر لەگەل گۆڕانکاریەگەورەکانی جیهانی لە پیشکەوتن وسەرهەلدانی عەولەمەو وەرچەرخانی وولاتانی شیوعیەت بە(قەیرانی عەقلیەتی عربی) بەرجەستە بۆوە ، ئەوەش حوکمێکەبوێریەکی زانستی زۆری دەوێ، ئەوبوێریەلەلایەن مونەزیر وبیریارەگەورەکان بوویتە یارمەتیدەر بۆ ناوزەدکردنی بە (قەیرانی عەقلی ) لەوانە : تەها حسین، د فوئاد زکریا، علی وردی، د محمدئەرگۆن ،محمدعابدجابری ،دحامدخلیل،محمدالفزازی،قاسم صالح ، نصرحامدابوزید،برهان غلیون ...)، پیشووتریش ابن خلدوون ئەوباسەیان کردوە، بۆیە ئەو زاراوەیە باوی وەرگرتوە ئەگینا خودی عەقل قەیرانی نیە، دەبوایە سەردێرەکە ناوی (قەیرانی وەبەرهینانی عەقلی )بوایە ،چەندین کتیب بەو سەردیرە نوسراوە لەوانە :(بنیه العقل العربی –محمدعابدالجابری) ،(ازمة المثقفين العرب- عبداللة عروی) ،(فی نقد الفكر العربی-علی المخلسی) ،(ازمه العقل العربی –محمدالفزاوی) (اغتيال العقل: محنة الثقافة العربية بين السلفية والتبعية –برهان غليون) ،(مساهمة فی حل ازمة العقل العربی المسلم- طه ابراهيم) ،(ازمه العقل العربی المعاصر-دقاسم حسين صالح) (ازمه العقل العربی-د حامدخليل) ،راپۆرتی سالی 2013 (IQ)- Quotient ,lIntelligence، دەلیت وولاتانی عربی لە (معدل الذکاء) لەپاش هەمو جیهانن، زۆری تریش بەو عینوانە نەبوە لەناوەڕۆکا باسیان کردوە لەوان سلامە موسا ،تەها حسین،..زۆری تر،هەمو ئەوانەی ڕەخنەیان لە واقعی عربی هەبوەو هەیە ، لە بنەچەدا ڕەخنە بوو دوای ئەوەی چارەی نەبوو ناویاننا( قەیران)، بەشیك پێیان وایە لە قەیرانیش تیپڕیەو گەیشتە ئاستی نەخۆشی، ..لەبەرامبەریشدا بەشێك لەناشیۆنالیزمی عربی وئیسلامی باس لە فەزلی عرب و پایەی گەورەوعەرەب بە ئومە دەکرێ ،ئەوانەش پشت بەدەقە فقهیەکان دەبەستن کە پیشووتر باسمان کردوە

،ئەوانەبە پیلان ولادەر دەزانی ،جاریش وایە توومەتی شعوبیان دەداتە پالّ ،بەلام نوسەرەکان عربن کەمتر دەچێتە ئەو قاوغە .. لەوانەی هاتونە وەلام جۆرج تەرابیشی کتیبیکی بەناوی(نقدنقدالعقل العربی)لە 408لاپەڕەیی بلاوکردەوە .

لە زاراوەی ئاینی (قەیرانی عەقلی)بەگشتی بە (جهل مرکب)گوزارش کراوە ،مەبەست لەوانەیە کە نەزانن خۆشیان پێزانایە ، ڕەنگە لە میژووی ئەکادیمی یەکەم کەس کە هەستی بەو دەردوقەیرانە کردبێ (سوکرات)بووبێ کە دەلیت جیاوازی من لەگەل خەلکی ئەسینا ئەوەیە من دەزانم نەزانم بەلام ئەوان نازانن نەزانن، تیگەیشتن لەو قەیرانە لەوە دێت کەوا بزانی زۆر پیشکەوتوو زاناو نەجیبی کەچی لەدواش بێت ،زۆر جار ئەوە بەسەر هەندێ لە میلەتان دێت کاتێ خۆیان پێ میلەتیکی جیا بێت لە پیشکەوتن و بالایی کەچی وانەبێت، ناو لە میلەتی عرب نراوە ئومەت شان بەشانی ئیسلام (امتی العربیە والاسلامیە)کەچی واش نەبێت، هەول بۆ چاکردنی نەدریت ، ئەوە ناونراوە قەیرانی عەقلی عربی .

ڕیشە وهۆکاری ئەو قەیرانە: هەمو تاك ومیلەتیك بەو قۆناغە تێپەڕیە تایبەت نیە بە میلەتی عرب ،لەهەمو سەردەمیکیش دەمێنێت، واتە ڕەهەندی قەیرانی عەقلی لەنیو هەمو میلەتیك هەیە ،هەر خودی سنورداری عەقل لە تیگەیشتن وهەلخەلەتان و..بنیاتی ئەو قەیرانەیە ،هەستەکان سنوردارن، چاو ئەو تەنانە دەبینێ کە ڕوناکی شەپۆلی لەنێوان (4-7) هەزار ئەنگسترۆمە، هەروەها گوێ و تام، هەلّخەلّەتانی (لمس)یش ئاشکرایە، ئینجا فکریش خۆی مەودای تەمەنی کورتە لەتەمەنی ئادەمیزاد خۆی کورت ترە، جا هەر لە ڕووی زانستیشەوە توانای تۆمارکردنی دیاردەکان لە (بیر) سنوردارە بە پێچەوانە ڕای (ئەنجلیس) کە وای زانی بێ سنورە[1233]، ئەوەی بۆ عرب تایبەتە هەندێ وەسفی فقهی وئەنسرۆپۆلۆجی وای لێکردوە ئەو دەردەی خۆی پێنەدۆزرێتەوەو هەولی چاکردنی نەدا، بۆیە ئەو قەیرانەی عەقلی عربی بەشێکی دریژکراوەی ئەزمەی عەقلی موسولمانە (کەلەدوای باسی دەکەین) .

---

[1233] لەبارەی بۆچوونی ئەنجلس لەوبارەیەوە بڕوانە: ف انجلس –انتی دوهرنك ص145 .

ئەو هەموو ستایشەی بۆ عرب کراوە لەلایەن فقهو هەندێ مێژوو نوس هەلیخەلەتاندون ،بە پیچەوانەی قورئانی پیرۆز کە سەرزەنشتی کردوون وهانی چاکردنی داوون ، فقه لەدوولاوە بەرپرسە لەو قەیرانە لەلایەك دەرگای کرانەوەی عەقلی داخست بەوەی (لم یترك السلف للخلف شیئا) واتە پیشینەکان هەمو زانیاریەکانیان داڕشتوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان پێویست بەبیرکردنەوە بەرهەمی عەقلی ناکا ،پێویست بە ئیجتهاد ناکات، وەك ئەوانە وایە کە میراتێکی زۆری مالی بۆ بەجێمابیت و پیویست بە کاسبی ومالداری نەکات ،لەلایەکی تریش ستایشیکی زۆری عرب کراوە لە زیرەکی و نەجیبی و مژاردەی خوایی و(ارض الرسالات والارض الانبیاء و...) کە بناغەیەکی واشی نیە ، واوەسف کراوە کە عەقلی عرب لە عەقلیکی تر زیرەك ترن ،زمانیان لەسەرووی هەموو زمانیکە ...تا دەگاتە ئەوەی بلێن لەهەموان زیاتر لە ئاین دەگەن ،بۆیە کەسیتی عرب تەنها حوکمی کردوە هەولی فکری نەداوە لەهەردوو خەلافەتی ئەمەوی وعباسی ،دوای ئەوانەش ئەو دەردە خراتر کاری لێکردوە .

لە چەمکی (تەعریب) باسی ئەو دۆخەی تەعریبی فقهیمان کرد ،لیرە باسی ئەو ئەو فەقیهو ئیمامانەش دەکەین کە هۆکارن بۆ دروست بوونی قەیرانی عەقلی عربی ، گەلێ زۆرن بەلام زیاتر ئەوانەی خوارەوە توند تر بووینە : ئیمام شافعی –احمد-مالك-ابن تیمیة –ابوقاسم زمشخری –حافظ العراقی - إمام الهیثمي - وإسحاق بن إبراهیم -عبد الله بن الزبیر الحمیدي وسعید بن منصور جاحیز و...، (ابن قتیبه ) لە کتیبی ( فضل العرب والتنبیه علی علومها) ،إمام العراقي (محجة القرب في فضل العرب) مرعي الکرمي ( مسبوك الذهب في فضل العرب) ،الشیخ بکر أبو زید ( خصائص جزیرة العرب ) ...زۆربەی ئەوانە دەیان ووت: پیویستە قسە بە عربی بکریت بۆ عەقل باش ترە بە واجبیش هەژمارکردوە لە ڕێزی فێرکردنی قورئان وسونە و دەلێ مندالیش فێربکرێن ، لەوبارەیەوە ئیمام ئیبن تەیمیە دەلیت : (وإنما الطریق الحسن: اعتیاد الخطاب بالعربیة، حتی یتلقنها الصغار في الدور والمکاتب، .. واعلم أن اعتیاد اللغة، یؤثّر في العقل والخُلُق والدّین تأثیراً قویاً بیناَ. ... وأیضاً فإن نفس اللغة العربیة من الدین، ومعرفتها فرض واجب. فإن فهم الکتاب والسنة فرض. ولا یُفهم إلا

بفهم اللغة العربية) [1234].دەشلێن (ح عمر) گوایە ووتویەتی : (تعلموا العربية فإنها من دينكم، وتعلموا الفرائض فإنها من دينكم) لەبەرامبەریشدا زەمی زمانی عەجەمی وفارسی کردوە ، أبو منصور الثعاليي (430هـ) ووتويەتی : ( محمداً خيرُ الرسل، والإسلام خير الملل، والعرب خير الأمم، والعربية خير اللغات والألسنة)...، دەشلێن بەو هۆیە وە هیزی عەقلی عرب زیاتر دەبیت ولە خۆڕسکا زیرەك تر دەبن لە خەلکی تر ئیمام ابن تيميە دەلیت : (فغلب على العرب القوة العقلية النطقية، ..ولهذا كانت العرب أفضل الأمم)[1235]،زۆر بە توندی دژی (ابن سينا)وەستاوە بەگەمژەی وەسف کردوە چونکە ووتویەتی خوا هیچ میلەتیکی لە میلەتیکی تر زیرەك تر دروست نەکردوە[1236] ، دەشلێت : (... كما أن جنس العرب يستحق من المحبة والموالاة ما لا يستحقه سائر اجناس بني ادم.)[1237] ئیمام يوسف الحنبلی لە کتیبی(مسبوك الذهب، في فضل العرب) بە تەرازویکی تر پۆلینی میلەتان دەکا ودەلێت (أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، كما إن جنس الرجل أفضل من جنس المرأة من حيث الطائفة والعموم) ، ئەو تەوەرە زیرەکی وعاقلیەکی بێماندووبوونیان پێدەدا ،بۆ ئەوەی بەبیرکردنەوەو داهێنان خەریك نەبن ،لەو تەوەرەی داهاتووش بەرگریان دەکوژی بەوەی گوایە دژایەتیان کوفرە (بغض جنس العرب ومعاداتهم كفر... وأن محبتهم سبب قوة الإيمان) بۆیە خۆشیان بۆ بەرگری ئامادەنەکرد ،بزانە چۆن ئەو زنجیرە وەسفە بۆیان دەبێتە قەیران ، لەسەر ئەو بنچینە ( أبو القاسم محمود الزمخشری) دەلیت چەندە بەختەوەرم خوایە بە عربت دروست کردووم (اللهَ أحمدُ على أن جعلني من علماء العربية، وجبلني على الغضب للعرب والعصبية، وأبى لي أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز، وأنضوي إلى لفيف الشعوبية وأنحاز، وعصمني من مذهبهم الذي لم يُجْدِ عليهم إلا الرشقَ بألسنةِ اللاعنينَ، والمَشْقَ بأسِنَّة الطاعنين)[1238]، دوای ئەوانە هەنگاویکی تر دەنێن عەقلی عربی لە خۆبایی دەکەن ودەلێن ئەو فەزل وزیرەکیە لەبەر ئاین وپیغمبەر نیە ،هەر خودا بەتایبەت بۆ

---

[1234] ابن تيمية -اقتضاء الصراط المستقيم ج2 ص207 .

[1235] ابن تيمية -مجموع الفتاوى ج15 ص431 .

[1236] ابن تيمية –درء التعارض ج3 ص37

[1237] منهاج االسنة النبوية ج4 ص279

[1238] أبو القاسم محمود الزمخشري– (المفصل في علم العربية– المقدمة) .

عربی کردوه ( واعلم أَنَّهُ ليسَ فَضْلُ العَرَبِ ثمَّ قُرَيْشٍ ثُم بني هَاشِمٍ بمجردِ كَوْنِ النبي (ص) مِنْهُمْ كما يُتَوهمُ -وإِنْ كانَ هوَ عليه السلام قد زَادَهُمْ فضلاً وشرفاً بلا ريب- بل هُمْ في أَنْفُسِهِمْ أَفْضَلُ وَأشرفُ وأَكْمَلُ)[1239]. دەشلێن (تفضيل العروبة إنما هو اختيار من الله تعالى) له (الصحيحين): (الناسُ تَبَعٌ لقريشٍ في هذا الشأن: مُسلمِهُم تبعٌ لمسلمهِم، وكافِرُهُم تبع لكافرهِم). ( فەرمودە) روى الحاكم والبيهقى عن ابن عمر قالرسول(ص): لما خلق الله الخلق اختار العرب، ثم اختار من العرب قريشا، ثم اختار من قريش بني هاشم، ثم اختارني من بني هاشم ) ..هەمو ئەوانە وای لە عرب کردوە کەمتر بیربکاتەوە مادام زیرەکیەکە میراتی وخواپێداویە ،کەمیش بیر لە بەرگری و خەبات دژی داگیرکاری بکاتەوە بۆیە هەم زاناو فەیلەسوفیان کەم ببەرهیناوە هەم وولاتیشیان زۆر داگیرکراوەو ئیستاش لەهەردوو قەیرانی سەختدان .

یەکێك لە گەشەی عقلی بریتیە لە تێکەلی وفرەڕەنگی کە لەڕێی هاوسەری لەگەل میلەتانی جیاو بنەمالەی جیا کەچی ڕێ لەوەش گیراوە عرب لەگەل میلەتانی تر تێکەل بن ، بۆیە هاوسەری قەدەغە کراوە لە نێوان عرب وغەیرە عرب ، زۆربەی مەزهەبی سونە ئەو ڕایەیان هەیە ،بردوویانەوەتە سەر گۆتەیەکی دروستکراوی (سلمان ): (اثِنْتَانَ فَضَلْتُمُونَا بِهَا يَا مَعْشَرَ الْعَرَبِ لاَ نَنْكِحُ نِسَاءَكُمْ وَلاَ نَؤُمُّكُمْ) ، لیرەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ کە ژن هێنان لە عرب ماناجاهلیەکەی عربی وخیلەکیی وەرگرتوە نەك ئاینیەکی ،تیایدا زاوا تاوانبار بوەئەگەر بێگانە بووبێ ،سەرکەوتن بۆ ئەو خیلە کە پیاو لەوان بیت وژن لە وانی تر،بۆیە ژنیان نەدەدا بیگانە ، دەلی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدو شافعی ئەو بۆچوونەیان لەوانی تر زیاتر هەیە تاڕادەی لیکجیاکردنەوە ، وەك لەو نمونەیەی هاوسەری زانایە کوردەکەبە ئافرەتێکی عرب کە لە (بابەتی تەعریبباسمان کرد)..

سەرەنجام ئەو کارەساتە دروست بوە بۆ تێکڕای جیهانی ئیسلامی وبۆ جیهانی عربیش بوە قەیرانی عەقلی ، تا ئەو ساتەش تەیاری عروبی (بە ئاینی وعەلمانیەوە)پەیڕەوی ئەو بۆچوونە فقهیانە دەکەن ،لەوەش مەترسیدار تر بەو عەقلە قەیرانیاییەوە دەیانەوێ عرب بکەنە مەلبەندومەرجەعی جیهانی

---

[1239] ابن تیمیە -ا الاقتضاء..ص**148** .

ئیسلامی ، ئەو بۆچوونە فقهیانە تا ئیستاش زیاتر زالە بەسەر سیستەمی عربی ، لە دیباجەی (الميثاق العربي لحقوق الإنسان 2004)وەسفی (ئومەی عربی) وادەکا:( انطلاقاً من إيمان الأمة العربية بكرامة الإنسان الذي اعزه الله منذ بدء الخليقة)[1240] ، زیاتر لەوەش تیۆری ناشیۆنالیزمی عروبی سەردەم خۆی لە ئاین جیا کردەوەو چوە ژێر باری سیکولاریزمی رۆژئاوا بەلام دەستیان لە فقهە بەرنەدا ،چونکە خەزێنەیەکی گەورەی عروبی تێدایە ، دەتوانین بلێین ئەوانە فقهی عروبەن ، فقهی (فەزلی عەرەب)، ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرموودە)ی وەك (حب العرب ايمان)، (العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام) ، لەو بارەیەوە جیاوازیەکی وا لە نێوان زانایەکی ئاینی وعەلمانیەکی ناشیۆنالیزمی عربی نابینیەوە ،تەنانەت لە نێوان زانای ئیسلامی ومەسیحیەکی عربی ،گەورە مونەزیری ئیسلامی عەرەب ئەنوەر جوندی دەلێ: العرب مادة الاسلام، اختار الله تبارك وتعالى العرب لحملة رسالة الاسلام..، وعلاقة الاسلام بالعروبة هى علاقة عميقة الجذور بعيدة المدى حتى تكاد ان تكون علاقة عضوية )[1241] ، لەسەر ئەو بنچینەیە بەشێك پێیان وایە پیش هاتنی ئیسلام عەرەب لە (سەردەمی زێڕین)بوە نەك نەفامی وجاهلی[1242] ، بە هەمان شێوە میشیل عفلق دەلێ: (العروبه جسم والإسلام روحها)، زیاتر لەوەش وەك ئەنوەر جوندی خاوەنی کتیبی (العروبه بين الشعوبيه الإستعمار)دەلیّ خواش بۆ پیادەکردنی پەیامەکانی پێویستی بە عرب هەبوە ، لەکۆتاییدا دروشمی (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)ی لیّ هاتەدی کە بەرهەمی ڕاستەوخۆی ئەو جۆرە فقهەیە کە عرب و میلەتی تر لیك جیادەکاتەوە بۆیە ناوی عرب بەجیا دێت لەگەل ئومەتی موسولمان . ، جمالدینی ئەفغانی هەولیدا نێوبژیەك لە نێوان عروبەو ئاین بۆ ئەوەی عەرەب بەسەر ئیسلام نەخرێ

---

[1240] لە کۆنگرەی (16)ی لوتکەی کۆمکاری عربی -تونس- 23 مايو/أيار 2004 .

[1241] بروانە : معلمة الاسلام -م2 -العرب والاسلام ص264 وص260

[1242] د الياس فرح- من قضايا الثورة والانسان العربى ص190

ئەوەش بوە هۆی پتەو بوونی دروست بوونی هاوتایی نێوانئومەی عربی وئومەی ئیسلامی ،بەهەمان ئاڕستەی تەقەلایی کە جامعەی عربی دروست بوو شیخ امجد زهاوی چوە سەردانیان وزۆری هەولدا ببێتە جامعەی ئیسلامی بەلام سەرکەوتوو نەبوو زیاتر تەیاری ناشیۆنالیزمی جێگیر بوو[1243].

لە مێژوودا زۆرجار ئەو ئیدیعایەی فەزلی میلەتیك کراوە ،ڕایەکی بلاو هەبوو لەکۆنەوە گوایە (پیاوی ئاینی وقەشەکان)دەبێت لەنەوەی سام بن ،سوارچاکەکانیش لەنەوەی یافپ،هەژاریش لەنەوەی حام ..(گوایە لەبنەچەدا لەعنەت لە حام کراوە )دەلێن ئەوە کۆنترین دابەشی ڕەگەزپەرستیە لەسەر بنچینەی ئاینی_جاران فارسەکانیش ئەودەردەیان هەبوو ،ئیجا ڕۆمیەکان وگەلی یۆنان خۆیان بە گەورەو نەجیب زادە دەزانی تا ئەو ڕادەیەهەریەکەلە ئەفلاتون وئەرستۆ باسیان لەوە کردوە کەهەموو مرۆڤ لە قوڕن بەلأم قوڕەکەی گەلی یۆنان زێڕیشی لەگەلْ بوە ،بۆیەهەموو مرۆڤەکان وەك دەمی شانە یەکسان نین وئیتر فەزلیان بەسەر میلەتی تر هەیەولە میلەتانی تر زیرەك ترن ، یەهودیەکانیش دەلێن ئێمە (شعب الله المختار)ین، لە هەمو میلەتانی تر زیرەك ترین ،لە پروتوکولات حکماو صهیون- هاتووە: ((وقد منحنا الله العبقریه کی نکون قادرین علی القیام بقیاده العالم ))[1244]، لە(تیلمۆد )دەلیْ هەرچی یەهودی خۆش نەویْ کافرە .. هەندیْ جار مەسیحیەکانیش لەو بۆچوونە گلاون ، ویخاطب القدیس بطرس المؤمنین بالمسیح قائلًا ( وَأَمَّا أَنْتُمْ فَجِنْسٌ مُخْتَارٌ، وَكَهَنُوتٌ مُلُوكِيٌّ، أُمَّةٌ مُقَدَّسَةٌ، شَعْبُ اقْتِنَاءٍ، لِكَيْ تُخْبِرُوا بِفَضَائِلِ الَّذِي دَعَاكُمْ مِنَ الظُّلْمَةِ إِلَى نُورِهِ الْعَجِيبِ. الَّذِينَ قَبْلًا لَمْ تَكُونُوا شَعْبًا، وَأَمَّا الآنَ فَأَنْتُمْ شَعْبُ اللهِ. الَّذِينَ كُنْتُمْ غَيْرَ مَرْحُومِينَ، وَأَمَّا الآنَ فَمَرْحُومُونَ) (1بطرس2/9-10).

ئەوانەی ئەو بۆچوونەیان هەبوە تووشی کیشەی زۆر گەورە بوون وەك بینیمان رۆمان وفارس بەهۆیەوە کەوتن، عوسمانی لە دوای سەدەی 19 ئەو دەردەی توش بوو کەوت، نازی لەئەلمانیاو فاشی لە ئیتالیا بەهەمان شێوە، یەهودیەکان بەو هۆیەوە تووشی هۆلۆکۆست بوون ، ناسریەکان وحزبی بەعس بەو دەردەچوو ،..ئەوانەی پیشوو چارەی خۆیان کردو ئیستا لێیان نەبوە ئەزمەی عوقلی ،هەرچی

---

1243 الامام امجد الزهاوی –کاظم المشایخی ص220.

1244بروتوکولات حکماء صهیون—پرۆتۆکۆل رقم: 5

برایانی عەرەبە تا ئەو ساتە وازیان نەهێناوە بۆیە تووشی ئەو قەیرانە بووینە ،قەیرانیك خۆت پێبالاٌ بیت کەچی لەدوا کاروانی هەمو میلەتان بێت ، لەوبارەیەوە ووەك هۆکاری قەیرانی عەقلی عربی (د محمد شحرور)هۆکارەکانی کۆکردۆتەوە لە:

1– أنه عقل ترادفي، لأنه عقل شعري، والشعر لا يعيبه الترادف، فليس على الشاعر أن يفرق بين الأب والوالد في قصائده. والعرب أنتجوا ثلاثة آلاف شاعر في القرن العشرين، ولم ينتجوا عالماً واحداً. إننا لم نتعلم من أوروبا إنتاج المعرفة، أما اليابانيين فقد فعلوا ذلك.

2 – أنه عقل قياسي: والعقل القياسي يحتاج إلى نسخة أصلية ليقيس عليها. والعقل العربي عقل قياسي سواء كان مؤمناً أو ملحداً. فالمؤمن يقيس على حياة القرن السابع، والملحد يقيس على حياة الاتحاد السوفياتي سابقاً والصين حالياً. وهذا من أسباب جعل العقل العربي عاجزاً عن إنتاج المعرفة.

**هەلسەنگاندن وڕاستکردنەوە** : هەرچەندە بەشەکی زۆرلە زاناو میژوونووس و فەقیهـ دژی ئەو جۆرە بۆچوونە فقهیانە بووینە ،دژی فەزلی هیچ میلەتێك بەسەر میلەتی ترو نەجیبی و ماقولی میلەتیك وزیرەکی میلەتیك وعاقل تری و ..هەمو ئەوانەیان بە جۆریکی تری نەفامی لە قەلەم داوە ، بەلام توومەتیان بۆ دروست کراوەو ڕایەکەیان بەهەند وەرنەگیراوە لەلایەن عرب، تەنانەت کتێبەکانیان فەوتاندوون یان قەدەغە کراون، لەو کتیبانەی دژ بە فەزلی عرب دەرچوو : (انتصاف العجم من العرب) (فضل العجم على العرب وافتخارها)...ئەو کتێبانەیان نەهیشتوە [1245]، هەرچەندە پشتیان بە دەقی ئایەت وفەرمودە بەستوە ،لە هیچ ئاینێکی ڕاستەقینەی ئاسمانی جیاکاری لەسەر بنچینەی ڕەچەلّەك و خوێن و ڕەنگ نیە، (..ان اکرمکم عند الله أتقاكم)، (لا فضل لعربي على أعجمي ولا أبيض على اسود..)،لەدوا وەسیەتی پێغمبەر(د خ) ئەوانەی ساغ کردەوە، ئەو جۆرە بانگێشەیە بە نەفامی (جاهیلیەت) حساب بووە لەلایەن ئاینی ئیسلام ، ئیمامی علی بە شیعر وەلامی داونەوە :

---

[1245] الموسوعه العربیه العالمیه ج11 ص716 .

فأن يكن لهم من اصلهم حسب          يفاخرون فالطبل والماء

مالفضل الا لأهل العلم          على الهدى لمن استهدى ادلاء

ابن خلدون و(القاضي أبي بكر بن الطيب   وزۆری تریش..) بەپێچەوانەوە نەك پێی وایە عرب زیرەك ترو عاقل تربن، بەلكو بە میلەتێكی دڕندەو بیابانی دژ بە شارستانی وەسفیان دەكا ، بە (امە الوحش)وەسفیان دەكەن، ابن خلدون(فصل 26مقدمة ) : إنهم أمة وحشية ، أهل نهب وعَبَث ، وإذا تغلبوا على أوطان أسرع إليها الخراب ، يهدمون الصروح و المباني ليأخذوا حجارتها أثافيَّ للقدور ، ويخربون السقوف ليعمّروا بها خيامهم ، وليست لهم عناية بالأحكام وزجر الناس عن المفاسد ، وأنهم أبعد الناس عن العلوم و الصناعات.. ، ئەو بۆچونەی ئیبن خلدوون لە ئەنجامی یەك دیاردە نەهاتوە ،قوولە، خۆشی عربە بۆیە نەتوانرا توومەتی شعوبی بدەنە پالی ، لە پیش ئەویش قورئان هەندێ وەسفی كۆمەلگەی عربی بە نەفام ونەزان ودڕندە كردوە (الاعراب اشد كفرا ونفاقا واجدر الا يعلموا حدود ما انزل الله على رسوله والله عليم حكيم ) ،بە (اشدالكفر-نفاق) و(المخلفون من الاعراب) ،( واجدر الا يعلموا حدود ما انزل الله)...،هەولدراوە خۆلە زاراوەی اعراب دووربخەنەوەو بلێن عرب و اعراب جیاوازن ، لە فقها كەمتر ئەو زاراوە دەمێنێت بەلكو دەبیتە (عرب) كوردو تورك وعەجەم دەبنە (اكرادواتراك واعاجم..)، كەچی بۆ عربیش لە قورئان (لعلكم تعقلون)هاتوە، هەولەكان هەموی لەوە چڕبوویتەوە كە سنوریكی جوگرافی بۆ (اعراب) دیاری بكەن و بلێن مەبەستیان دەشتەكی وئەهلی بیابان وڕەوەندە –جگە لە هەندێ زاناو میژوونوسی وەك (جرجانی)  كە ئەعرابی وجاهلی پێكەوە بەستوەو دەلێ (اعرابى هو الجاهل من العرب)[1246]،  هەرگیز پەیامی ئاسمانی لەسەر بنچینەی جوگرافی حوكم لەسەر بەشەریەت نادا ، ئەو پۆلینەی بیابانی وشاری پۆلینی فلسفەی یۆنانیە نەك پەیام ، بۆدابەشی چینایەتی جۆربەجۆرو تێڕوانینیان بۆ دابەشی بەشەریەت لەسەر بنچینەی ژینگەو جوگرافیا بە جۆرێك ئەوروپا بە بالاو ئاسیا بە نزم ، رۆم بە ڕەسەن وخەلكی تر بە ناڕەسەن ،خەلكی شار بە نەجیبزادەو خەلكی دەشت بە نەزان ونەفام ، زاراوەی دیمۆس كە دوای بوە بنچینەی دیموكراسی لەو دابەشیە هەلەیە هاتوە ،

---

[1246] جرجانی – التعریفات ص24 .

هەندێ جار مەسیحی ویەهودی لادراویش ئەو پۆلینەیان پەیڕەو دەکرد ، خودی ئەو پۆلینەش نەفامیە ، لە(قاموس الكتاب المقدس - دائره المعارف الكتابیه المسیحی ) زاراوەی (اعراب) بەمانای (دەشتەکی) وەرگیراوە لە فەرهەنگی یەهود نەك ئیسلام ،لە (هەمان قاموس دەڵێ: وكانت كلمة أعرابي تعني لليهود سكان القفار المتنقلين أكثر مما تعني سكان المراعي الذين يتحضّرون ويستقرون وخاصة المتنقلين منهم قرب الهلال الخصيب (اش 13: 20 و2 أخبار 21: 16)،سەرچاوەی ڕاڤەو واتای ئەعراب لەلایەن موفەسیرەکان لێرەوە دێت ، لە بنەچەدا ووشەی (عرب) لە زمانی کۆنی سامی بە (بیابان)ووتراوەپەراوێزی شیعر ، كلمة (عرب)تعني في اللغات السامية (القفر) أو (البادية) ، واتە ئەعراب وعرب لە ڕووی جوگرافی جیاوازیەکیان نیە ، لە یۆنانی ولاتینی زاراوەی(**ساراسێنس**–(Saracens)بۆبەکارهاتوە،لە ووشەیەکی یۆنانیەوە (**Σαρακηνός**) ئەویش لەلاتینی وەرگیراوە، بۆ خێوەت بەکاردەهێنرا، دواتر ووشەکە بۆ عەرەبەکان بەکاردەهێنرا، کە بە واتای دانیشتوی خێوەت و بۆ ئەو کەسانەی بیابانین و کۆچەرین ،کەسانێك کە توند و دلڕەقن، بەجۆرێك ئاگایان لە ژیانی شارستانی نیە، لەکۆنەوە ئەم چەمکە بۆ عەرەبەکان بەکار دەهێنرا، دوای بۆ هەمو موسولمان بەکاردەهات ، لە کتیبەکانی قبتی ومسیحی (امه الغبیه) لەگەل عەرەبیەتی، جاء في (تثنية21/32) قوله : ( هُمْ أَغَارُونِي بِمَا لَيْسَ إِلهًا أَغَاظُونِي بِأَبَاطِيلِهِمْ. فَأَنَا أُغِيرُهُمْ بِمَا لَيْسَ شَعْبًا بِأُمَّةٍ غَبِيَّةٍ أُغِيظُهُمْ)، هەندی زانای ئیسلامیش ئەو ڕایەی هەیە - قال الشيخ رحمه الله الهندى : المراد بالشعب الجاهل هم العرب لأنّهم كانوا غاية الجهل والظلم ولم يكن عندهم علم من العلوم وما كانوا يعرفون إلا عبادة الأوثان[1248]، لەسەدەی بیستەم بەشێکی زۆر لەکتیبەکانی سیکولاری وئیسلامی ڕادیکالی وادەلێن ، جمال بەنا دەلی کۆمەلگەی عربی پیش ئیسلام جگە لە (نەفامی )هیچ وەسفیکی تر هەلناگریت ،چونکە هەر خەریکی قومارو خواردنەوەوڕێگری وتالان وپەلاماری لەخۆ لاوازتروکۆیلایەتی و..ئەوە ببوە بەشیك لە کەسیتی

---

[1247] قاموس الكتاب المقدس -دائره المعارف الكتابيه المسيحى-الماده: عرب .

[1248] كتاب إظهار الحق- ج2ص208و209.

[1248] جمال البنا –المرأة المسلمة بين تحرير القرأن وتقييد الفقهاء ص17

عربی[نیشمیرتر]،ئەو کەسێتیە بە خویندنی تایبەتی بۆ کوڕەکانی خەلیفەو والیەکان دەرسی تایبەتی (ایام العرب)هەبوە کە نەفامی پەتی بوە،هەر ئەوە ڕێك دەرسی فێرکردنی قەیرانی عەقلیە ، لەوەوەدەردەکەوێ ئەعراب و نەفامی و (ایام العرب) هەرگیز قەتیس نەماوە لە نێو کۆمەلگەی بەدەوی ، ئەو بەهایەی جەنگ وپەلامارو ستەم کردن شانازی نوسەرو ڕەوشەنبیرو شاعیرو هەمولایەك بوە، معاویە کوری ئەبوسوفیان نیوەی شەوەکانی بە (ایام العرب) بردۆتە سەر[بر هیرتر]،ڕینمایی ناردوە ئەو دەرسانە بخریتە منهج ،لەو ڕوانگە نەفامیەوە زاراوەی موالی هاتەوە مەیدان کەلەسەردەمی پیش ئیسلام بەکۆیلەکان ووتراوە موالی،لەو سەردەمەش بەجۆرێکی تر لەدەرسی میژوو شانازی بە (ایام العرب) و(کۆمەلگەی نەفامی)دەکریت ، سیدقوتبیش وا دەلێ بە جۆرێکی ترو بە (المجتمع الجاهلی ) وەسفیان دەکا ...

لەبەرامبەر ئەو ڕاستیانە ناچار ناشیۆنالیزمی سەردەم وەك دەسەلاتی هەندێ سولتان وخەلیفەی عرب هەلساون بە قەدەغە کردنی ئەو کتیبو بۆچوونانە ، لە زانکۆکانی عیراق لەسەردەمی (حزبی بەعس)کتیبەکانی ئیبن خلدوون قەدەغە بوو ،لە هەندێ وولاتی تری عربیش ، بەکورتی هەرچی بەسەر فقە هاتوە لە ڕێی ئەزمونی سەقەتی دەسەلاتی سیاسی دوای (خەلافەی راشدین)دێت ، لە دوو هۆکاری سەرەکی ،یەکەمیان لە ئەنجامی کاروکاردانەوەی ئەوانەی ڕەخنەیان لە جۆری دەسەلاتی ئەمەوی وعەباسی دەگرت، لە بەرامبەردابەشیك لە ئەهلی فقە فتواو پینەیان بۆدەکردن، دوەم هەندی خەلیفەو کەسە نزیکەکانیان کاری زۆر بەدڕەوشتانەیان دەکردن ناچار فەقیهە ستۆیلەکانیان فتوایەکیان دەدۆزیەوە وبەدەستکاری سیرەو فەرمودەو میژوو و قسەی هاوەلان ،بۆئەوەی عەیبەکانیان بشارنەوە ، تائەو ساتەش خەریکە بلێین لە ڕابوونی نوێی ئیسلامی دووبارە ئەو بالە توندەی نێو بزوتنەوە ئیسلامیەکان زیاتر بەلای عەرەبن ، ئەو بالە بریتین لە کۆمەلە جهادیەکان و قاعدەو داعش وسەلەفی جهادی یان ئەوانەشن کە لە ژێر کاریگەری عەقلی عەرەبین .

---

[1250] بۆ پرسی زاراوەی (ایام العرب)بڕوانە : د عبدالستار جبیر- الهویة والذاکرة الجمعیة ص11 وص18وص19

**نیشانەکانی ئەو قەیرانە:** دواکەوتنی وولاتانی عربی لەو سەردەمە لە ئاستەکانی سیاسی وفکری وفەرهەنگی وزانستی وتکنۆلۆجی ئاماژەی ڕوونی ئەو قەیرانەن، ئەو کاتە دەبێتە قەیرانی عەقلی ئەگەر ئەو دۆخەی دەسەلاتی سیاسی ڕەنگدانەوەی دۆخی کۆمەلایەتی بێت ، وەك هەلویستی رۆمانسی عادەتەن میلەتی عرب ودەسەلات لێك جیادەکەنەوە ،بەلام بە تویژینەوەی ئەکادیمی دەردەکەویٚ کە ژینگەی عربی زۆر یارمەتیدەری رژیمی سیاسی عربیە کە لەجیهان وەك تاقانە ماون ، وولاتانی عربی تاقانەن کەدەسەلاتی سیاسیان دیکتاتۆری ومەلەکی (نا دەستوری) و ڕێز نەگرتنی هاوولاتی و ڕەخنەو معارەزەو دەست گۆڕی دەسەلات ، وولاتانی عربی بەو هەمو داهاتە سروشتیەی کەچی لە ڕوەکانی تەکنیکی وزانستی وسیاسی ویاسایی وتەعلیمی ..زۆر لەدواوەیە ،سەرجەم قەیرانەکان لەکتیبی ( حتمیة التغیر –فی الشرق الأوسط)1-الحروب 2-التوتر بین العالم العربی والعالم المتحضر 3-مشاکل الداخلیة 4-عدم وجود الحریة 5-حکم قبلی 6-الطریق الوحید للتغیر هی إما الإنقلابات أو الإغتیالات 7- سیاسة فیها یساوی عنف ..)[1251]، لە ( مشروع اخوان مسلمین للإصلاح) دەلێت (سستی لەگەشە- گەندەلی وزولم-پاشکەوتنی زانست وتکنۆلۆجی) جیهانی عربی کوشتوە .

برهان غلیون لە کتیبی(اغتیال العقل: محنة الثقافة العربیة بین السلفیة والتبعیة) دەلیت:( الاستبداد یفضي إلي تخلف العقل، وتخلف العقل یؤدي إلی تخلف التربیة وتخلف التربیة یؤدي إلي نقد التراث والدین. وهکذا نظل ندور في حلقة مفرغة منتقلین من المشاکل الثقافیة إلی المشاکل السیاسیة والاجتماعیة والتاریخیة دون أن نستطیع حسم أي منه)، لەڕاپۆرت و هەلسەنگاندنە نیودەولەتیەکانیش باس لەو قەیرانەی عربی بە ڕاڤە دەکەن ، هەربۆیەش ئەو هەمو پرۆژە چاکسازیەی بۆ دەرچوە ،لەوانە: پرۆژەی ئەوروپی بۆ چاکسازی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (کۆنگرەی برشلۆنە 1995) -پرۆژەی( مبادرە الشراکە کۆلن پاول /امریکا 12دیسمبر2002 ) - پرۆژەی ( ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی

[1251] د احمد طحان–حتمیة التغیر فی الشرق الأوسط،دارالمعرفة ط12006م،بیروت ص22–23

گەورەی ئەمریکی لە 2004 )- پرۆژەی (المبادرة الألمانية )- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە 2004ز - ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی فراوان ئەلمانیا و فرنسا 2004 ز - پڕۆژەی ئیسرائیل (شمعون بيرس- الشرق الأوسط الجديد) .

ئەوە هەر وولاتانی ئەورووپی نین باس لە پیویستی گۆڕانی بارودۆخی وولاتانی عربی و ژێرخانە کۆمەلایەتیەکان دەکەن ،بەلکو لە ئاستی فەرمیش دان دەهێنرێ بەو دۆخە خراپەی عرب، بۆیە دەبینین جامعەی عربی خۆشی پڕۆژەی ئامادەکردوەو دەلێت(القناعة الكاملة بأن الإصلاح امر ضروری)[1252]،لە پڕۆژەی ئیخوان مسلمين هاتوە:(ان ثالوث المدمرلهذه الأمة هى جمود السياسى ،فساد والظلم الإجتماعى،تخلف علمى وتقنى )[1253] .

لەو پڕۆژەو ڕاپۆرتە نیودەولەتیانە جەخت لە چەند تەوەریك زیاتر دەکرێتەوە کە بەکورتی ئەوانەن :

1- لەبارەی رەوشی سیاسی: لە ڕاپۆرتێکی (بەڕێوەبەری نەخشەی سیاسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی لە ژێر ناوی (نحو ديمقراطية شاملة فى العالم الإسلامي 2003) جگە لە(ئیسرائیل) باقی وولاتی عربی بە دیکتاتۆریەتێکی زۆر تاریك وەسف دەکا ،لەڕاپۆرتی (التنميه الإنسانيه العربيه ) هاتوە :کەم ترین ئازادی لە جیهان بۆ وولاتانی عربی دەگەڕێتەوە، بەلکو زۆربەی وولاتانیان لە پۆلی (الدوله الفاشله) ومیلەتەکەش بە لاوازو سست وبێ ئیرادە پۆلین کراوە..

2-رەوشی زانستی : لە دەست پیشخەریەکەی کۆلن پاول هاتوە : رۆژهەلاتی ناوەڕاست خاوەنی رەسەنی زانست وهونەرو شارستانین کەچی ئیستا میلەتانی ئەو ناوچە هەژارن لە زانستی سیاسی وئازادی وئابوری ..،حکومەتەکانیشیان بریتین لە دیکتاتۆر ،10 ملیۆن مندال ونیوەی ئافرەتانیان نەخوێندەوارە،سەرجەم 65 ملیۆن نەخویندەواری لییە[1254].

3- رەوشی ئابووری: 14ملیۆن بێ ئیش وکار وبرسی هەیە، لەو ناوچەیەگەشە زۆر لاوازە بەبەراورد لەگەل خراپ ترین وولاتی ئەورووپی (ئیسپانیا) دەبینین 260 ملیۆن عەرەب بە ئەندازەی 40 ملیۆن

---

[1252] بڕوانة: نص وثيقة اسكندرونة -تمهيد

[1253] بڕوانة دةقى(مشروع اخوان مسلمين للإصلاح) .

[1254] بڕوانە دەقی (مبادره کولن باول)

ئیسپانی بەرهەمیان نیە ،هەتا ئەو بەراوردەی عرب بە ئیرانیش لاوازە، جگە لەنەوت تەنها 1٪ی بازاڕی جیهانی کەل وپەلی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی تیدایە[1255] ، بە پێی راپۆرتی (التنمیە البشریە لعام 2002) دەکاتە40٪، بۆ سالی2020 نزیکەی 100ملیۆن ئامادە دەبیّ بۆ کار کەچی دەولەت دەتوانی 6ملیۆن وەرگری ،30٪ی دانیشتوان تەنها رۆژانەی 2$، قەبارەی ئالو گۆڕی بازرگانی لە نێوەخۆی وولاتانی عربی یەکجار زۆر کەمە.

4-رەوشی مافی مرۆڤ: 3٪ ی ئافرەتان دەتوانن کار بکەن ، ونیوەی ئافرەتانیان نەخوێندەوارە..سالانە وولاتانی عربی لە ریزی پیشەوەی هەمو ڕاپۆرتە نیودەولەتیەکانن سەبارەت بە خراپی رەوشی مافی مرۆڤ.

5-رەوشی گەشە(تنمیە) : ج بۆش پشت بە کۆمەلیك توێژەری بالای عەرەب دەبەستیّ ودەلیّ: خەریکە بلێین ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست وسەرووی ئەفریقا (سەرۆکی ئەمریکا بە ئەدەبانە ئەو سنورەی کیشاوە ئەگینا ڕێك مەبەستی وولاتانی عربیە ) بیّ بەشە لەو گەشەو ئازادی ودیموکراسیەی تەنیتەوە بە جیهان ،هەژاریو نەخویندەواری ، 60سالە هەست بە گەشەیەکی واناکەین لەکاتێکا لەو فەترەیە هند لەو پەڕی دواکەوتووی گەیشتە ئەو قۆناغە[1256] .

6-پرسی پەنابەری و کۆچ: بە پێی راپۆرتی (التنمیە البشریە لعام 2002) سەرجەم 51٪ی عەرەب دەیەویّ کۆچ بکا لە وولاتی خۆی، کیشەی هەرە گەورەی ئەوەیە بۆ هەردەستکاریەك ژمارەی کۆچ زیاد دەکا هەروەك لەدوای بوهاری عربی ڕوویدا ، خەریکە ئەو دەستەواژەی کوردی بێتە دی کە دەلێن (چاکی مەکە با تێکنەچی) .

7- سستی گەشەی ژینگەی عەقلی : لە پرۆژەی (فرنسی- ئەلمانی )هاوبەش بە ڕاشکاوانە تر دەلێن وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست بە مالێکی زۆرو عەقلیکی کەم کار دەکەن،..زانیاری وداتایەکی زۆری تر لەو پرۆژانەو لە توێژینەوەی تر هاتوە کە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەو فۆرمە گەشە

---

[1255] ئەو راپۆرتە هەندیّ لای لە پرۆژەکانی چاکسازی بلاو کرایتەوە ..بۆ زیاتر بڕوانە : د احمد ابراهیم-مشاریع الإصلاح فی شرق الأوسط ص420-

[1256] بڕوانە دەقی ووتارەکەی ج بۆش6نوفمبر2003 .

ناکا، لە تعلیم زۆر خراپ ترە بەرهەمی کتیب  تەنها 1٪ پڕ دەکاتەوە،تەرجەمەی کتیب بۆ یۆنان 5 جار هەندی عربیە،تەنانەت قەبارەی ئالو گۆڕی بازرگانی لە نێوەخۆیان کەم ترە لە 6٪ ..[1257]،زۆر کیشەی تری هەیە بەهۆی ئەو ڕەوشە عەقلیەتە لەناوەخۆ ئەوانە بوو لەگەل میلەتانی دراوسێو پرسی مافی چارەنوس و شەڕەتایفی ومەزهەبی ویەکتر قەبول نەکردن و  ئەوانە هەمو ڕاستەقینەن نەك لەسەر ئاستی دەولەت بەلکو لەسەر ئاستی کۆمەلایەتی وتاکیش .

هەندێ گۆتەی تری وەك تیۆری پیلان و گوناح خستنە ئەستۆی خەلکی ترو خۆ بەزلزانی و ...نیشانەیەکی تری ئەو قەیرانەیە ، مکسیم رۆدنسن لە کتیبی(العرب) باس لە عەقلی پڕلە پیلانی دەکاو دەلیٚ عەقلێکی هەلچوانەیە وادەزانیٚ کە:(عەرەب ئومەتیکی نەجیبن ولای خودا بەرزترن لە میلەتانی تر ، خاکەکەشیان خاکی پەیام وپیغمبەرانە، بۆیە پیلانی بەردەوامیان بە نهێنی وئاشکرا کیکراوەو دەکریٚ ،ئامانجی ئەو پیلانە گەورەو فراوانەش لەناوبردنی ئەو روحەیە کە ئومەی عربی هەلیگرتوە )، قەیرانەکە لەوە دروست دەبێت کەوابزانی زانای کەچی نەزان بیت ، ئەو دۆخە بەزاراوەیەکی فقهی گوزارش کراوە بە(جهل المرکب) ،کە سەرەتای قەیرانی عەقلیە ، لەسەر ئەو بنچینەیە بۆچوونی ناشیۆنالیزمی عربی  لە بارەی بارودۆخیکی وێرانی عربی وپارچەپارچەیی بە (متخلف) وەسفی دەکا،هەندێ نیشانەی بۆ دیاۆری کردوە ،لەوانە  : جیهانی عربی بۆ 4 لا دابەش کردە ،1-ئەو رژیمانەی بەیەکجاری چارەنوسی خۆی داوەتە دەست ئیمپریالیزم 2-جۆرە رژیمیکی تری تەبەعی دوور لەڕەچاوی بەرژەوەندی ئومەی عربی 3-رژیمەخیانەتکارەکان 4-کۆمەلە رژیمیکی دواکەوتوی کۆنەپەرست .

زۆربەی جار ئەو جۆرە قەیرانە عەقلیە پیلان وتیۆری وەهمیت بۆ دروست دەکا وەك ئیمام علی  ناوی ناون (احمق) وپیێیان دەلیٚت (فإنه کالسراب یقرب علیك البعید و یبعدعنك القریب )...لەکۆتایی ماوە بلێین نیشانەی هەرە گرنگی ئەوقەیرانە ئەوەیە کاتیٚ تاکی عەرەبی لە ژینگەی عەرەبی دەردەچێت کەسێکی ئاساییەو ئەو قەیرانەی نیە ،واتەقەیرانەکە بایۆلۆجی نیە بەلکو ژینگەیەو بواری چاکردنی هەیە ،باشترین بەلگەی تر ئەوەیە کاتیٚ ئەو ژینگەیە خەفە دەبێت بەهۆی کارلێك کردنی لەگەل

---

[1257] بڕوانە دەقی پرۆژەی ئەمریکی (مشروع الشرق الأوسط الکبیر للإصلاح-ا2004 ) .

دەوروبەر لە میلەتانی تر دەبینین ئەو قەیرانە کەمتر دەبێتەوە ، بە پیچەوانەش تا ڕووبچینە ناو مەلبەندی عەرەبی (کە کەنداوە )دەبینین ئەو قەیرانە زیاد دەکات ،لە ئامارێکی (IQ)-lIntelligence Quotient، راپۆرتی سالی 2013هاتوە وولاتانی عربی لە (کۆی گشتی–معدل الذکاء)زۆر لەپاشن عیراق لە پیشەوەی وولاتانی عربیە وقەتەریش لە هەرەدواوەیە ،ڕوون دیارە عیراق بەتەواوی لە ژینگەی عەرەبی نیە کەچی قەتەر بەتەواوی لەناو ئەو ژینگەیە ...ماموە ئەوەش بلێین قەیرانی عەقلی و عەقلی پاشکۆیی لێك نزیکن ،ئەوە لە بابەتی قەیرانی عەقلی کوردیەوە باسی دەکەین ،هەردووکیشی (واتە قەیرانی عەقلی و پاشکۆی) لەگەل (دواکەوتەیی) پەیوەندیدارە .

لە دواکەوتەییەوە بۆ قەیرانی عەقلی :

قەیرانی عەقلی عربی هەموی ناکەوێتە ئەستۆی عەرەب خۆی ،بەشیکی گشتیەو پەیوەندیدارە بە عەقلیەتی بەشەری ،ئینجا عەقلی موسولمان ..، زۆریش نوسراوە کە عەقلی بەشەری سنوردارە، هەستەکانمان کە کلیلی مەخزەنەکانی عەقلن هەر هەمووی سنوردارن، چاو ئەو تەنانە دەبینێ کە ڕوناکی شەپۆلی لەنێوان (4-7) هەزار ئەنگسترۆمە، هەروەها گوێ و تام، هەڵخەڵەتانی (لمس)یش ئاشکرایە، ئینجا فکریش خۆی مەودای تەمەنی کورتە لەتەمەنی ئادەمیزاد خۆی کورت ترە، جا هەر لە ڕووی زانستیشەوە توانای تۆمارکردنی دیاردەکان لە (بیر) سنوردارە بە پێچەوانە ڕای (ئەنجلیس) کە وای زانی بێ سنورە[1258]، لەهەموان توند ترلەو ڕوەوە کتیبی(گالتەجاری عەقلی مرۆڤەکان- مهزلە عقل البشری)نوسرایتەوە،بەشیکی تر پەیواندیدارە بە دواکەوتەی عەقلی موسولمان ئینجا بەشیکیش تایبەتە بەعەقلی عربی خۆی.

ماوەیەکی دوورودرێژە جیهانی ئیسلامی کەوتۆتە دواکەوتەیی فکری و فلسفی و زانستی وتکنولوجی وسیاسی و کۆمەلایەتی ، بەهۆی ئەوەی کە تەیاریکی فقهی وعەقائدی دژی عەقل وەستان بەئامرازی جیاجیاوتومەتی جیا وای کرد لەگەشە بوەستی ،بەناوی ئەوەی (تعمق)لە ئاین باش نیە ، عەقلانیەت لە ئاین لات دەدا ،فلسفەو فکر تیکت دەدا، داخستنی دەرگای ئیجتهاد بە

---

[1258] بۆ ئەو ڕایەی ئەنجلس بڕوانە : ف انجلس –انتی دوهرنك ص145 .

هۆی(السلف لم يترك للخلف شيئا)..ئەوانە هەمو دورکەوتنەوەیە لە ئەسلی پەیامی مرۆڤ وهەمو ئاینە ڕاستەقینەکان (کەبەرپاکردنی شارستانی) یە، ڕازی بوون بە لێکجیاکردنەوەی (عولەماوئومەرا) (سیاسەت وفقه) ( ئەهلی قەلەم وئەهلی سەیف )..، ناو ناتۆرەیان لە زانست وتکنۆلۆجیا بە (علمی شەیتان)وەسف کرا ،بەشیك لە فەقیهەکان دژی زانست وفلسفەو عەقل وکیمیاو فیزیا وەستان ،بە جاریك گەشەو پیشکەوتنیان پەك خست ،...ئەوانە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی ،لەسەر ئاستی عربی لەو کاتە توشی قەیران بوە کە ویستویەتی هاوکیشەکەیەکی گەردوونی پیچەوانە بکاتەوە ،هاوکیشە ئەسلیەکە ئەوەیە ئادەمیزاد پیویستی بە پەیام هەیە نەك پیچەوانە ،ئەوە عرب بوە پیویستی بە هاتنی ئاینی ئیبسلام وپیغمبەر هەبوە کەچی ئەوان دەڵێن نەخیر خواوپەیام وئاین پیویستی بە ئێمە بوە ، بۆیە هەم عرب فەزلی هەیەو هەم نیشتمانی عربیش (ارض الرسالات)ە ،بۆیەش عرب خۆی ئومەیە ودەبێ لەئومەتی ئیسلام لێك جیابکریتەوە بووترێ (امتی العربیە والاسلامیە) ،بەوشێوەیە نەیان ویستوە تەنها عروبی وئیسلامی تیکەل بکەن بەلکو بیکەنە پیشڕەو ،لێرە سەرەتای قەیران دەست پێدەکا چونکە ئەو دەستکاریە ناکرێ،ناچار دەستکاری میژووی دەوێ وکردویانە،تەعریبی میژووی دەوێ وکردویانە،دەستکاری دەقی دەوێ تا لە ئاینیکی مرۆڤایەتیەوە وەری چەرخێنە ئاینیکی ڕەگەزپەرستی، بۆ ئەوەی فەزلی عرب بەسەر میلەتانی تر جێی ببێتەوە، ئیترلەو تەقەلایەوە قەیرانی عەقلی عربی دروست بوە.

ئەو قەیرانە نەیتوانیە بگاتە دەقی ئاینی بەلام بە توندی گەیشتۆتە فقه ومیژوو وڕوانگەی سیاسی ، بەشیکی زۆری میلەتان بەو قۆناغەی (لیواری قەیرانی عەقلی تێپەڕین)بەلام بە خیرایی خۆیان ڕاست کردۆتەوە کە خوای گەورە ئیمتیازی بە هیچ میلەتیك نەداوەو کەس لە کەس موفەزەل تر نیە،ئەوە لەگەل کۆتایی سیستەمی سیۆکراتی تەواو بوو ،دوا پاشماوە تراجیدیەکانی ئیتوحادتەرەقی عوسمانی و فالانژیسی ئیسپانی ونازی ئەلمانی وفاشی ئیتالی و(شعب الله المختار)ی یەهودی بوو ،بەلام لەناو عرب هیشتا تەواو نەبوە ، بەو قەیرانە هاتونە دنیای نوێ، بەو ناسنامەش هاتونە نێو عەولەمە .

**رۆلی ئیستعمار له تۆخ کردنی ئەو قەیرانە:** زۆر جار باس له تیۆری پیلان و تەقەلای ئیستعماری و رۆلی ماسۆنی وزایۆنی وتەبشیری فاکتەری دەرەکی تر بەزیادەوەکراوە ، وای کردوە ئەوتوومەتە ببتە گالتە جاڕی ، ڕاستیەکەی وانیە پیلان ورۆلی ئیستعماری وتەبشیری هەبوە بەلام له قۆناغیکی دیاری کراو ، ئیستا وەرچەرخاوە بۆ دەزگا هەوالگریەکان و هەریەکە تایبەت بەوولاتی خۆی ، لەسەرەتای سەدەی بیستەم فاکتەری دەرەکی وپیلان هەبوە بەتایبەتی لەسەر عقلی عربی کەخۆی قەیرانی دواکەوتەیی زانستی وفکری وفلسفی هەبوە بە هۆی وەستانی بەرهەمی عقلی کەلەسەروو باس کرا، ئەو پیلانانەشی دێتە سەر قەیرانەکە زیاد دەکات بەتایبەتی لەسەرەتای سەدەی بیستەم،هەندیکی لێباس دەکەین کە کاریگری هەبوە لەسەر هاندان ودروست کردنی قەیرانی عقلی عربی:

1- بوونی پەیوەندی زۆربەی شیخ وسەرکردە عربەکان بە بریتانیاو خیانەتیان لەگەل خەلافەتی عوسمانی ،کەبە( مەلەفداران)ناوزەد دەکرێن ،لەکاتیکا ئەو دیاردەیە لەناومیلەتانی تری ناوچەکەی غەیرە عرب نەبوو ، ئەو شیخانە لەگەل عوسمانی بون، بەلاّم موچەیان لە بەریتانیا هەبو بە نهینی، تادوای ڕوخانی عوسمانی ئاشکراکران، یەکەم جار گۆڤاری(شؤون خارجية) کەلە لەندەن دەردەچو لەمانگی 1927/1ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسكريت) لیستێکی موچەی مانگانەی ئەمیروشێخ وکەسایەتی عەرەبی تێدا بلاّوکرایەوە: (1 ـ ابن السعود 100.000 جنيه، 2 ـ ملك حسين ـ شريف مكة ـ 100.000 جنيه، 3 ـ فهد الهذال 140.000 ربية، السيد الأدريسي12.000 ليره..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژیەی بۆ بەریتانیا دەیکەن[1259]، لەدوای جەنگی جیهانی لە چاکەی (الشريف حسين بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی خەلات کران، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە 1916 قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس رۆیشت، لەو پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی بە (وسام النصر) و (صليب الحرب مع النحل) خەلاّت کرا[1260]، بەلام بنەمالە ئاینیەکان ئەو پارەو زیرەیان ڕەت کردەوە

[1259] عبدالرزاق الحسنی - تأريخ الوزارات العراقية -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92

[1260] برِوانة (الاسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة-باحث- (يضيف فورستر ان بوانكارية –رئيس وزراء فرنسا وملك بريطانيا عندما قلدا الوسام وإعتبره حليفا لهم بما قدمه من الخدمات، ومن الجانب البريطانيا إستقبله ملك جورج الخامس ومنح وسام فكتو ريا الملكی لخدماته الإضافيةوالدور المذكور فی هدم الخلافة وتسهيلاته لتنفيذ وعد بلفور وتوقيعه المعاهدة مع وايزمن حول منح فلسطين لليهود).

کەچی دوای حکومەتەکان لە خائینەکان دروست کراو ئەهلی ئاین دوور خرانەوە ،تا ئیستاش وولاتانی عربی لەو دریژکراوەن ...، دوا خەلات لە بارەی دۆزی فلستین درا ئەنوەر سادات لە خەلاتی نۆبل بەهۆی ریکەوتنامەی ئاشتی 1979.

2-قۆزتنەوەی بیرۆکەی (خەلیفە دەبێت عەرەب بێت)، ئیستعمار توانی عرب دژ بە عوسمانی هانبدا، چەندین هاوپەیمانی لەگەڵ شێخەکانی عرب مۆر کردن، بەمەبەستی دروستکردنی دەوڵەتۆکە بەپێی ستانداردی بەریتانیا، لە پێش هەمویان ڕێکەوتنی قەتیف 26 دیسمبر 1915م لەگەل سعودیە ، هەروەها ڕێکەوتنی تر لەگەل شیخەکانی کەنداو، لەوانە: بەریتانیاو (قواسمەکان) لە 6/فبرایر/1806، دووەم لە11 /ینایر/1820 لەگەل شیخەکانی (رأس الخیمة، ابوظبی، بحرین، عجمان، ام القیوین، ..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە1892..، بەلینیان بە بەریتانیادا، کەئەوبراگەورەیان بێت لە هەمو ئیش وکاریکی ناوەو دەرەوە بەتایبەتی کاری نەوتی[1261]، یەکەم بنکەی سەربازی بەریتانی لە 1861دامەزرا لەکەنداو بەهۆی ریکەوتنیکی بریتانی لەگەل میری بەحرەینبۆ پاریزگاری لیکردنی دژ بە عوسمانی و فارس[1262] ، پیشوو تریش لەسالی 1737ز بە سەرپەرشتی بەریتانیا ڕێکەوتنامەیەکی نێوان (حمدی کوری ئال سعود و ئیمام محمد بن عبدالوهاب) مۆرکرابوو، لە میسریش ڕێکەوتنی وا لە 19 ینایر و 10 یولیو/1899گرێدرابوو، لە سالی 1915ش ڕێکەوتنی شریف لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی مۆرکرا، بوە هۆی سەرکەوتنی گەورەی بەریتانیا بەسەر خیلافەتی عوسمانی .

3-سایکس پیکۆی1916 ودروست کردنی ئەو دەولەتە عربیانە بەو شیوازە کاریگەری توندی دەبێ لەسەر عەقلیەتی عربی،چونکە سەرونجامەکانی سایکس پیکۆ بریتین لە :

أ-بۆ دابەشی وپەرتەوازەیی کەواشی لیهات

ب-بۆ ئەوەی عەرەب لە ئیسلام جیا بکرێتەوە، کێشەی فەلەستینی داهاتووش نەبێتە کێشەی هەمو ئیسلام، بۆ ئەم مەبەستەش زاراوەی وەك الامە العربیە یان (الأمتي العربية والإسلامية) بەکار هات

---

[1261]- دەقی ڕێکەوتنەکان لەکتێبی ایران والخلیج العربی ص42- زۆربەشیان بەپەنجە مۆریان کرد خوێندەواریان نەبوو.

[1262] پیتر مانسفیلد- تاریخ الشرق الاوس ص197

بۆ زیاتر بەرجەستەکردنی ئەو لێك جیاکردنەوەیە، لە لێك جیاکردنەوەی عەرەب وئیسلام ئۆتۆماتیکی دەبێتە هۆی پارچەپارچەکردنی عەرەبیش[1263].

ج-بۆ ئەوەی تواناکان و توخمی گەشەسەندن پەك بخری و هەرچاویان لەبازاری ئەوان بێ، ، (لورانس) لەگفتۆگۆیەك لە (تایمس) لە 23/7/ 1920 دەڵێت: من دلنیام دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانە بۆ عەرەب دلسۆزی و ئەمەکمان بۆ مسۆگەر دەبێ و نرخی سەنتیکیشی لامان نیە)

د-ئامانجێکی تری ئەوە بوو کە ئەو ناوچەیە هەر لەنائارامی بمینیتەوە، لە (بروتوکولات حکماءالصهیون- ژمارە: 10 هاتووە)،

ع- بۆ ئەوەی ئازادی نەبێت ، دەسەڵاتداری دکتاتۆری بێ، تا ئیستاش لە جیهان تەنها ئەوان ماونەوە بە دیکتاتۆریەت،لەوەش گەشەی عەقل دەکوژی .

ف-دیسان لەکۆتاییدا سەرهەلدانی ئەو دەولەتە دەستکردو نامۆیانە دەبیتە هۆی ئاسایی بونی سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی ئیسرائیلی نامۆ لەناوچەکە.

4-بەلینی بلفۆری 1917، لەدوای سایکس پیکۆو دابەشی ناوچەکەو دروست کردنی دەولەتی بچوك بۆ عرب هەنگاویکی تر دیت ،بەلینی بەلفۆرو دروست کردنی دەولەتی ئیسرائیل لە ناو جەرگەی عرب،لەلایەك گەلێ زولمە لەلایەکی تریش سەرۆکە عربەکان خۆیان بەشدار بووینە، ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی ئیستا بەو رێکەوتن و کۆنگرە و مادەکانی سیڤەر دروستکراون، بەهەمان ماددە و رێکەوتن ئیسرائیلیشی پێ دروستکرا (لە ماددەی (95) باس لە جێبە جێ کردنی بەڵێنی 2/ تشرینی / 1917 دەکا)، لەراستیدا ماددەی 95 خوردکردنەوەی دەقی بەڵێنی بەلفۆرە، هەرچەندە لە رێکەوتننامەی سیڤەر ناوی بلفۆر و دەوڵەتی ئیسرائیلی تێدا نەهاتوە، خۆشی ئەوکاتە نەبوو تا لە 1948 هاتەدی ، زیاتر لەوەش سەرکردە عربەکان رازی بوون ببنە سەرۆك بەمەرجی دروست بوونی

---

[1263]- بروانە: مەرجەکانی سەربەخۆیی لبنان کەلە (میثاق لبنان) هاتوە: بعد إتفاق بين (بشار الخوري المسيحي) و(رياض الصلح المسلم) في عام 1934 وسمي ب(ميثاق لبنان) وجاء فيها:أن يكف المسلمون عن المطالبة بالوحدة مع سوريا أو أية وحدة عربية، وان هذا شرطٌ للإستقلال. المصدر:سعدالدين ابراهيم –ملل والنحل والأعراق ص595. عندما اعتلى فيصل عرش العراق عام (1921)م قيد بالشروط نفسها . فورستر... نشأة العراق ص156

ئیسرائیل ، هەر ولاّتێك بۆ سەرۆك یان مەلیكێكی عەرەبی دیاری بكرابایە دەبوایە پالّپشتێك (تەزكیە)لەلای ڕێكخراوی زایۆنی بهێنێت، لەسەر ئەو بنچینەیە(شكری غنام)سەرۆكی وەفدی سوری لە1919لەبەرامبەر كۆمیتەی ئاشتی ڕێككەوت لەگەل نوێنەری ئاژانسی زایۆن بۆ ئەوەی یەهودیەكان بتوانن بێ ڕێگری بۆفلستین كۆچ بكەن تادەبنە زۆرایەتی حوكمیشی دەگرنە بەر، بەهەمان ئاڕستە مەلیك فەیسەل لە 1919/5/3 ڕێكەوتنێكی لەگەل (حایم وایزمان) مۆر كردخۆی ببیتە مەلیكی عیراق لەبەرامبەر دروست بوونی ئیسرائیل ، پیشوو تریش شیخەكانی كەنداوبەوكارە هەلسابوون .

**5**-سیستەمی ئینتداب، بە پێی (مادەی 22ی بەشی یەكەمی عەهدی عوسبەتولئومەم)وولاتانی عربی كەوتنە ژێر سیستەمی ئینتدابی دەولّەتە داگیركەرەكان، لەوێش بۆ ژێر ئینتدابی بەریتانی . ئینتدابیش مانای ئەوەبوو كە ئەو میلەتانە (كران 3 گرووپ A,B,C)نازانن خۆیان بەڕێوە ببەن ، عەرەب ڕازی بوو بە سیستەمی ئینتدابی رۆژئاوا، واتا دانی بەوە نا كە عەرەب قوتابین وئینگلیزو فرنسیش مامۆستان، ئەوەیان تەنها عرب لەو ناوچەیە قەبوولی كرد میلەتانی تر ئەوەیان قەبوول نەكرد،كە دانپیاهینانیكی بێوینەیە لەمیژوو بلّێی میلەتی تر لەمن عاقل ترن ، قەیرانە بنچینەییەكە لیرە دێت وا تیگەیەنراوە كە عرب لە میلەتی تر زیرەك ترە كەچی ئەوە سەرەنجامی بێت ،بۆیە چەندە ئیستعمار لەقەیرانی عقلی عربی بەرپرسە ئەوەندەش ئەو فەقیهانەی ئەو فتوا چەوتانەی داوە . هەمو ئەوانەو بەردەوام بوونی دەسەلاتی عربی دیكتاتۆر یەكجاری قەیرانی بۆ دروست كردن، لە قەیرانا پەرپەوە بۆ دیل وپاشكۆیەتی، واتە تاڕادەیەكی زۆر قەیرانی عەقلی عربی پەیوەندی دارە بەو دیزاینە سیاسیەی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرپا بوە .

<u>**قەیرانی عەقلی عربی**</u> : محمد عابدجابری ئاوا عەقلی عربی پیناس دەكات : العقل العربي(جملة المبادئ والقواعد التي تقدمها الثقافة العربية الإسلامية للمنتمين إليها كأساسٍ لاكتساب المعرفة، وتفرضها عليهم كـنظام معرفي) ، لە شوینیكی تر( لا تعكس الواقع العربى الراهن ولا تعبر عنه بل هى مستعارة فى الأغلب الأعم ، من الفكر الأوروبى،.. وإما من الفكر العربى الإسلامى الوسيطى

..، واقع معتم مستنسخ إما من هذة الصورة أو تلك من الصور..)[1264] هەنديك قەيرانى عەقلى عربى قوول دەكەنەوە بۆ ئەزەل، ڕێك بەپێچەوانەى ئەو ڕايە فقهيەى دەلين (منذ خليقة) عرب بە فەزل دروست بوە نەك لەبەر بوونى محمد لەعرب،ئەو بەشەش دەلێن (منذ خليقة)عرب قەيرانى عەقلى هەيە بۆيە لە قورئانيش واى وەسف كردون (لعلكم تعقلون) و دوايش ابن خلدوون ئەو ەى ڕوون تر كردۆتەوە ، بەلام لەشوێنێكى ترى قورئان باس لەوە دەكات كە عەقل بە يەكسانى دابەش كراوە ،(ديكارت)يش دەلێ دادگەرى ترين دابەشى دابەشى عەقلە بۆهەموان وەك يەك لەلاى خواوەوە .

هەمو لايەك جۆريك لە قەيرانى عەقليمان هەيە مادام نەزانين بە لۆجيكانە بەكارى بهينين ، ئەوكاتى دەگاتە پلەى ئەو فەرمودە( يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ , وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ ) كەمەبەستى پيچەوانە بوونەوەى پێوەرەكانە، لێرە زياتر ماناى قەيرانى عەقلى دەردەكەوێ ،كە پێوەرەكان پيچەوانە بكەيەوە ، خۆى پێئەفزەلەو لەخواروە ، خۆى پێ زيرەكەو دواكەوتوە ، وەك دەبينين چەندين كتيب لەسەر قەيران ومەينەتى عەقلى عربى نوسراوە ،خەلكى پێ كرێگرتەو خراپە خۆى وايە ، يەهودى زياتر لە 50 يۆبيلياى زيرەكيان وەرگرتوە كەچى ژمارەى عرب پەنجا ئەوەندەى يەهودە،ئەوەى زۆر مەترسيە هەمان تاكى عربى لە ژينگەو نەريتى عربى دەردەچى دەبنە زاناى گەورە وديموكراسى خوازو ..جاروايە لە هەندەران گەيشتينە پلەى سەرۆك كۆمار (لەوانە:كارلۆس منعم)، خەريكە بلێين قەيرانى عەقلى عربى بەرەبەرە تۆخ دەبێت تالەناوجەرگەى عربى نزيك ببيەوە پيچەوانەشى بە پيچەوانە، بۆيەش بەدەگمەن لەو سەردەمە گوێمان لينابێت ناوى زانايەكى ئەكاديمى يان تكنۆلۆجى يان داهينانى كەنداو ويەمەن هەبيت ، يان ناويك بەناوى الفيلسوف العربى الكبيرفى السعودى يان ئيمارات يان قەتەر،لە پيشووتريش ئەو قەيرانە هەبوە كاتێزاناو داهينەرانى موسولمان خەريكى تەكنيك وهزروهونەر بووينە ڕەوشەنبيرانى عرب زياتر سەرقالى (ايام العرب) وپرسى نەسەب و شانازى بە كەسيتى توند بووينە ،بەگشتى داهينان وتكنۆلۆجيا لە مەلبەندى عربى لە هەموجيهان لەپاش ترە ،ناردنەدەرەوەى بەرهەمى عەقلى كەمتر لە 1٪ كەچى هينانى زياتر لە 99٪ يە،،قەيرانى عەقلى عربى لە چوارچيوەى (يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ , وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ) دەلى

---

[1264] تحديات الثقافية ص9 .

کوردوعەجەم سەربەئیستعمارو زایۆنین ،کەچی لەسەروو بینیمان کێ خیانەتی کردوە ،ئینجا ئیستاش ئەوەی بنکەی سەربازی رۆژئاوای لەباوەش گرتوە کوردو عەجەم نین هەموی لە وولاتانی عربیە ، ئەوەی خەلافەتی ئیسلامی ڕووخاند ئەوا تورکیاو سعودیە بووینە ،ئەوانەی فلستینیان دۆڕاند ئەوا باپیرانی ئوردن وعیراق وحیجاز بوون ، ئەوانەی لەژێرەوە لەسەردەمی عوسمانی مەلەفدار بووینە زیاتر عەرەب بووینە ، کوا یەك سەرکردەی کوردی لە مەلەفداری و نەبوە ،ئەو وولاتانەی ریکەوتنیان لەگەل ئیسرائیل هەیە کوردوعەجەم نین، وولاتانی عربین ،ئەوانەی وا لەگەل ئەمریکا ریکدەکەون بەناوی سەحوەو جاشایەتی کورد نین سونەی عربی عیراقن لەبەرامبەر مانگانە 300$ ، لەوەدەمەی برایانی عرب خیانەت لە خەلافەت دەکا کیانە عربیەکان لەگەل بەریتانیا لە ژیرەوە ڕیکدەکەون : لەگەل(قواسمەکان) لە 6/فبرایر/1806، لە11 /ینایر/1820 لەگەل شیخەکانی (رأس الخيمة، ابوظبی، بحرين، عجمان، ام القيوين، ..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە1892، لەگەل سعودیەش ریکەوتنی قەتیف..،دوای بە یاوەری (لۆرانس) هیرشیان کردە سەر خەلافەتی عوسمانی ئەو کاتی شیخ محمود خەریکی سەرخستنی خەلافەت بوە لە خوارووی عیراق، لەو کاتەی سەرکردە عربەکان خەریکی سەودا بوون لەگەل ئیسرائیل و یارمەتیدەری بوون سەرۆکی شۆرشی ئەیلول لەسالی 1967 شەری یەکلایەنی رادەگەیەنی بۆ ئەوەی سوپای عیراق بتوانی یارمەتی برای عربی بدات ، ئەوەی ئیستا لەگەل ئیسرائیل ئابلوقەی خستۆتە سەر غەزە ئەوە کوردوعەجەم نین ئەوە عربن .

لەو پیچەوانەوە بیرۆکەی نەخۆشی عەقلی دێت (..فی قلوبهم زيغ) وەك نوسەریکی عرب (بەناوی :احمد كمال)دەلێ قەیرانی عەقلی عربی نیە بەلکو نەخۆشیە ، دەلێ: (أن العقل العربي لديه أمراض خطيرة في التفكير تمنعه من الوصول لمعظم الحقائق) دەشلێ نەخۆشیەکانیش بریتین لە: (باوەڕکردن بەهەمو وەلامەکی بیتەبەین- قەلاچۆی ڕەخنە-گۆتەی عەبەسی- قوول نەبوونەوە — پیوەر نەبوونی ڕاستی- سودوەرنەگرتن لە وانەی ڕابوردو-نەبوونی زانیاری ئەولەویات- ..) .

چارەی : قەیرانی عەقلی عربی قەیرانیکی بایۆلۆجی نیە زیاتر ئایدیۆلۆجیە بۆیە چارەی دەکریت ،لە میژووشدا ئەو تیکەلیەی کەلتوری عربی وئاینی زیانی زۆری بە دیمەنی ئیسلامیش گەیاندوە ،دەبێ

به جوانی لێککرێتەوە کە: لە ئەزمونی خەلافەت ئەوەندەی سیاسەت وحوکم بوو بۆ عرب بوو لە ئەمەوی عەباسی جێی شانازی نیە ،علم وشارستانی وصناعە بۆ عەجەم بوە جێی شانازیەوگەشەی زۆری بە خۆ بینی، لەو ڕوەوە سەردەمیکی زۆر پیشڕەو بووینە ، ئەوە ڕای ئیبن خەلدوونیشە کەس ناتوانێ ونەیتوانیە تووەمەتی (شعوبی)بخەنە پالّی ، یان ووردتر بلّێین میلەتان بەبێ ئاین چ عرب چ کورد چ فارس وتورك تووشی قەیرانی عەقلی دەبن ،هیچ میلەتیك نیە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئاینی نەبێت ، بۆیە تەقەلای هاوتاکردنەی عرب وئاین سەرچاوەی کێشەکانە کە ئەو فەقیهانە بۆ عربیان دروست کردوە ،کە لە بنەچەدا لە ڕێنمایی دەسەلاتی ئەو کاتی هاتوە ،بۆیە چارەسەریەکان ئەوەندە ئاسان نیە کارێکی مێژوویی و واقعی قوولی دەوێت ،بەکورتی ئەوانەن :

1- پیش هەمو هەنگاویك دان نان بەبونی ئەو قەیرانە .
2- ئەو فەزلەی عرب بێبنچینەیە لابریت ببنە برا لەگەل میلەتانی تر.
3- تیکدانی ئەودیزاینەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست .
4- وەك کوردو و وەك مرۆڤیش بەرژەوەندیەکی زۆرمان لەوەیە کە ئەو قەیرانە چارە بکرێت چونکە یەکێکە لەسەرچاوەکانی قەیرانی عەقلیەتی کوردیش کە لەدوای باسی دەکەین ،بۆیە وا بە ڕاشکاوانە تر لەسەر ئەو چەمکە وەستاین .

(40)

**قەیرانی عەقلی موسولمان** ازمە عقل المسلم the muslim mind risis

**ئەوانەش دەگریتەوە ( دۆگما، اله الفجوات، تراکم المعرفە، ئەحمەق،جەهلی مورەکەب، ..)**

بناغەی ئەو چەمکە لێکدراوە لەوە دێت کە لەبنەچەدا ئاین بەگشتی وئیسلام بەتایبەتی واهاتوە کە پیشڕەو بێت،ئیستاش بەڕوونی دیارە جیهانی ئیسلامی کەوتۆتە دواکاروانی گەشە ،کاتێ ئەو پرسە درێژە دەکێشێ لە دۆخەوەو دەپەڕێتەوە بۆ دیاردەو ئاسایی بوون،ئەوکاتەش کە عەقلی موسولمان تەسلیمی ئەو واقیعە دەبێت و هەست بەوە ناکات کە دواکەوتوە دەبێتە قەیران(یان بە زاراوەی ئاینی دەبێتە جەهلی مرەکەب)، هەرچەندە لەسەردەمی عوسمانی وپیشی ئەویش دواکەوتو بوون بەلام کەمتر هەست پێدەکرا چونکە ئەو کاتی عەولەمە بەو پلەیە نەبوو بەراوردەکان ئاوا بەرچاو بن ،لەلایەکی تریش بەڕوانگەیەك کە گوایە مادام فتوحات و دەسەلات هەیە ئیتر(عزەت)هەیە ،کەچی ئاینی ئیسلام پلەی یەکەم شارستانی وزانست و داهێنانە ئینجا دەسەلات ، دەسەلاتیکی دادگەر ،بۆیە لەدوای ڕووخانی خەلافەتی عوسمانی لە 1924(یان لە 1908) ئینجا ئەو قەیرانە زیاتر دەرکەوت وکتیب وتویژینەوەی لەسەر نوسراوە ،لەوانە( أزمە العقل المسلم- عبد الحمید أحمد أبو سلیمان ،حول اعادە تشکیل العقل المسلم-عمادالدین خلیل، ..،لە کۆن هەریەکە لە ابن خلدوون و ئەبوعەلای مەعەری و خیام لە ڕێی شیعرو تویژینەوە ئەو ڕەخنەیان لە عەقلیەتی موسولمان گرتوە .

ڕەخنە لە عەقلی موسولمان جیایە لەگەل ڕەخنە لە ئیسلام ،ئەوەی یەکەم لەو سەردەمە پێی دەووترێ (قەیرانی عەقلی موسولمان) بە ئینگلیزیەکەی (the muslim mind crisis ) بەلام (ڕۆبیرت ریبلی)وای وەرگێڕاوە :the closing of the muslim mind( کردوویە بەکتاب ،زیاتر بەمانای (داخراوی عەقلی )دێت یان ئەوەی پێی دەووترێ دۆگما(واتە یەقینێك کە بنچینەی زانستی ودیالۆگی نەبێت بەلکو بە دەمارگیری خۆ بەیەقین بزانی و پیویستت بەزانیاری زیاتر نەبێت) ، هەمان پێناسی قەیرانی عەقلی عەرەبیە بە دەستکاریەکی سادەی وەرگەڕان ،لە عربیەکە هۆیەکە ناوەکیە ،لەوە

دەرەکیە ،ئەوقەیرانە قەتیس نیە تەنها بە ئاینی ئیسلام ،زۆربەی ئەهلی ئاینەکانی تر ئەو قەیرانەی هەیە ،لەوان هەر زاتی نیە مەوزوعیشە ،مەرجەعێك نەماوە ببتە پێوەر بۆ ئەوەی قەیرانەکەی پێ بپیورێ ،بۆیە وادەرناکەوێ ودەبێتە بەشیك لە پاشکەوتنی کۆمەل ،ئەویش لە ڕێگەی گەشەی زانستی وتکنیکی و فەرهەنگی چارەی دەکەن ،دووردەکەونەوە لە ئاینە ڕەسەنەکەیان مەگەر بە ناو مابێت ، هەرچی ئاینی ئیسلامە چونکە مەرجەعی چەسپاوی ماوە دەبتە تەرازوو بۆهەر قەیران وتێکگیرانێکی عەقلی ، قەیرانی عەقلی موسولمانی لیدەردەکەوێ ،پرسەکە ئالۆزتر دەبێت کاتیك ئەو چارەسەریە لەدەست ئاین دەردەچێ بۆ زانست وئایدیۆلۆجیا ،لەوەوە عەلمانی وئاینیێکی ناتەواوی لیدەردەچێ وەك ئیستا بارودۆخی عەقلی موسولمانی تێدایە .

**سەرچاوەی قەیرانی عەقلی ئاینی:** بەشێك تەواوی قەیرانی عەقلی موسولمان دەداتەوە پالْ عەقلی عربی ودەلێن ئومەتی یۆنان کە خاوەنی زانست وحیکمەتن بەرهەمەکەیان ئەو ئەوروپایەی ئێستایە ، دەشلین مادام عرب پیشڕەوی ئیسلامەو یۆنانیش پیشڕەوی مسیحی کەواتە سەرەنجامیکی لۆجیکی دەبیت ئەورۆ ئەوروپا واپیشکەوتو وشارستانی ببینین وعربیش بەو شێوەیە ،بەلام ڕاستیەکەی بەشی زۆری ئەهلی ئاین قەیرانیکی عەقلی لەتێنەگەیشتن لە خودی ئاینەکەی خۆی دروست دەبێت ،لەسەرەتا تێنەگەیشتن لە پەیوەندی خوای گەورەلەگەل (مخلوق) ،لەگەل سروشت وگەردون وبونەوەر بە ژیانیشەوە ، ئەهلی ئاین پێیان خۆشە وا وەسفی خودا بکەن کە خودا خۆی ڕاستەوخۆ بەکارەکانی سەر دونیا هەلدەستێ ،لە مردن ونەخۆشی وباران وکارەسات وچاکەوخراپە ، وەك لایەنی سایکۆلۆجی واحەز دەکەن تا دوعا بکەن وناخۆشیەکانیان لەسەر هەلسێ ،بۆیە بیروعەقلیەتیان بەرەو زانیاریەك لار بوویتەوە کە هەمو کارەکانی بوونەوەر خوا بۆخۆی دەیکا، وادێتە بەرچاو کە خودا زۆر سەرقال بێت ،کاتی کەم بێت ،پیویستی بە یاریدەدەر هەبێت ،بۆیە جاروایە یارمەتیدەرو هاوبەشی بۆ داتاشراوە ،لەکاتیکا وانیە .

دروست بونی پرسیاروگومان لە بارەی دەسەلاتی خوا لەو بوونەوەرە لە پرسێکی سادە دێت، هۆکاری هەمو ڕوداوو ئەنجامێك لەناو سروشت خۆی دەبینرێتەوە، جاروایە هۆکار و ئیرادەی سروشت لە ڕووداو و پێشهاتەکان لە ئیرادەی خوا بەهێز تر دەردەکەوێت، لە کۆنەوەو ئیستاش لای ئاینی وڕەشۆکی واباو

بوو تائەو سنورەی توانای مرۆڤی بەسەر نەبوایە دەیاندا پال خودا-ناو نراوە ( اله الفجوات)لەلایەن هەندێ توێژەری نوێ ،هۆکاری ڕووداوە دیارەکان دەدرا پال مرۆڤ ونادیارەکانیش دەدرا پال خودا،جابەرەبەرە کە توانای مرۆڤ بە هۆی زانست وتکنۆلۆجیا زیاد دەبوو، هۆکارەکان ئاشکرا دەکران.. وا دەردەکەوت کە توانای خوایی وا لاواز دەبێ توانای مرۆڤی زال دەبوو بەسەر توانای خوایی ، کەواتە لای ئایندارێکی ڕەمەکی بەلای کەمی(یاسای سروشتی) شریکە بۆ خوا وەك لە(دیزمی ئەگریکیەکان)واهاتبوو کە یاسای سروشت شریکن لەگەل خودا [1265]، چۆن خودا دروست کەرە ئاواش یاساکان دروست کەرن،بۆیە لە لیستی کتیبە قەدەغەکراوەکانی کنێسەو هەندێ جار لای موسولمانیش ( یاسای سروشتی)یش قەدەغەبوو ، کیشەیەکی گەورەبوەو ئیستاش گەورەیە ،بەلام لە فلسفەی دووڕەهەندی(خلق وئەمر)کۆتایی بەو کێشە گەورەیە هێناو وەلامەکەی زۆر سادەیە، یاساکان شریك نین لەگەل خودا بەلکو ئەمری خودان، یان وەك(هینزپاچلیز)لەکتیبی(دستور الكون) دەلێ ئەو یاسایانەی سروشت دەستوری گەردونن[1266]،دەتوانین بلێین دەستوری خواین بۆ بونەوەر، جیا لەدەستورەکانی تر ئەو دەستورە سەرتاسەری ونەگۆڕن بۆ هەتا هەتایە،لەوەوە فلسفەی هاتنی بەشەریەت ڕوون دەبێتەوە ، کە پەیامی مرۆڤ لە چوارچیوەی یاسای سروشتی دەسەلاتێکی پیدراوە ، (اني جاعل في الارض خليفة)یە، واتە خودا خۆی ویستویەتی بەشێك لەدەسەڵات بداتە دەست ئادەمیزاد بۆ فەترەیەکی زەمەنی بێ ئەوەی هیچ لەدەسەلاتی خۆی کەم بێتەوە، ئەگەر ئەو دەسەڵاتەی بۆ هەتا هەتایە پێ ببەخشیایە ئەوا دەگەیشتە پلەی (شريك) ،بەڵام هەم بۆ تەمەنی ئادەمیزاد و هەم بۆ تەمەنی کۆمەڵگە دیاریکراوە، لەهەمان کاتدا دەسەڵاتە پێدراوەکەش دیاریکراوە بۆیە وەسفی (بەندە-عبد) ی بۆ دەسازێ نەك (شريك)،لێرەوە لەگەل بیری دیزم و باقی عەلمانی میان ڕەویش لیك جیا دەبیتەوە، کەوا دەزانن دەسەلاتی مرۆڤ زۆرە تا ڕادەی شریکی وئەو دەسەلاتەی خواش بە مرۆڤی داوە لەدەسەلاتی خوای کەم کردۆتەوە ، هەر لێرەوەش بناغە فەلسەفیەکانی هاتنی پێغەمبەران ورۆژی دوای و پاداش و خێروچاکەو خراپە مانای خۆی دەدا ، ئەو سازانە فکری وئاینیە

---

[1265] بڕوانە: Routledg&Kegan- God and Timelesseness.. p3

[1266] بڕوانە: بؤل ديفيز- الإقتراب من اللة- ص98

زۆر بەزەحمەت دێتە دی بۆیە بۆبەشی زۆری ئەهلی ئاین ئەو پرۆسەیە دەبێتە سەرچاوەی دروست بوونی قەیرانی عەقلی .

**لەسەرچاوەوە بۆ قەیرانی عەقلی:** هەر لەدرێژەی ئەو قەیرانە تێگەیشتنەی سەروو دیوێکی تری بەجۆرێکی تردەردەکەوێ ،جاروایە بە خۆشەویستی جاریش وایە بەنەبوونی زانیاری نەریتیك لەهەلە کەلەکە دەبێت ، ڕایەکی نیمچە گشتی لە عەقلی ئاینی بەگشتی وموسولمان تایبەتی هەیە کەگەورەیی خوا لەوە دێت هەمو کارێك لەدەست ئەو بیت و وای وەسف بکەن، فەقیە وئیمامی گەورەکانیش حەزیان نەکردوە ئەوڕووداوە گەورانەی گەردوونی وزەمینی وباران ورزق وهۆی مردن ..بدەنە پال سروشت، یان یاسای سروشتی، نەیان توانیوە مەزنی خودا بە مەزنی دروستکراوەکانی خودا ببەستنەوە، بلێن سروشت ویاساکانی سروشت دروست کراو وفەرمانی خوایە ،بۆیە ئەو ڕووداوانەیان داوەتە ئەمری خودا کە لە قورئان باسی (امر)ی کردوەوبە پێی تیگەیشتنی خۆیان لە (امر) ،بەو هۆیەشەوە خەلکی ڕەشۆکی وای زانیە هەردەم لە پەیوەندیدایە لەگەل خوای خۆی وزیاتر لێی ترساوە،ئەگەر خوا لەو ڕووداوانە دوور خەیەوە ئەوا وادەردەکەوێ کە خوا دوورە،..بۆیە ئەو جۆرە فقهە لەلایەك خزمەتی کردوە بەلام لە سەردەمی پێش کەوتنی زانست دەبێتە بەلاّ، سەربردەی بروسك وهەورە تریشقە هۆی ئاینی وهۆی زانستی چەندە لێك جیا بوو ودوایش زانست بردیەوەو تەفسیرە ئاینیەکە(یان ووردتر ئەوەی بەناوی ئاین ووترا) وەهم دەرچوو ، بەوشێوەیە ناچار ئاینپەروەران دەکەونە بەرەیەك دژ بە عەقل وزانست وشارستانی کەلەبنەچەدا پەیامی ئاینی بۆ بەرپاکردنی شارستانی وئاوەدان کردنەوە هاتوە .

کاریگەری عەقلی ئەو تیڕوانینە بەوەندە ناوەستێ ئەهلی ئاین بەو تیڕوانینەی دەبێ دژ بە دۆزینەوەو گەشەی زانست وداهێنان بێت ، ئەو وای پێباشە بلێ ئادەمیزاد هیچ نازانێ هەموی خوادەزانی ، بۆیە دژی زانیاریش دەوەستێ ،لای ئەو کەشکستی زانستی ڕوودەدا جەژنیەتی ،بەو شێوەیە بناغەکانی قەیرانی عەقلی ئاینی بەگشتی دروست دەبێت،کە لەبڕگەی داهاتوو باسی دەکەین.

تەوەرەکانی قەیرانی عەقلی موسوڵمان : ئەوەی سەروو تیڕوانینیکی گشتی دروست بوونی قەیرانی عەقلی بوو ،بەو دەروازە ڕوو دەکەیەنە ئەو قەیرانە لە عەقلی موسوڵمان پەیدا دەبێت ، ئەویش بریتیە لە کۆمەلیك تەوەر ،هەرە بنچینەییەکانی هەلدەبژێرین :

1-عەقل وئاین : دوای ململانێیەکانی عەقلانی توندڕەو و فقهی توندڕەو بەزال بوونی دوەم ئەو دوو مەیدانە لێکجیابوونەوە ، ئینجا ئاین تەسك کرایەوە بۆ فقە بە تەنها ،ئەوە وادەرکەوت کە ئاین وئەقل ناتەبان ،سەرەتای دواکەوتن لێرە دەست پێدەکا ،ئەو ناتەباییە بوێری دابوو بە (دانتی) و (هوایتهد) و (شبلی عیمسی) زۆربەی عەلمانیەتی ئەو سەردەمەش داکۆکی لە بۆچوونەکەی (ابو علا المعری) بکەن کە دەڵێت: (خەڵکی سەر زەوی یان عاقڵن و بیٚ ئاینن، یان ئاینین و بیٚعەقڵن..)هەروەها دەلین: سەرکەوتن بۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بۆ ئاین[1267]، هەرلەوەشەوە (همنکوای) دەلیٚ بەسروشتی خۆی هەموو عاقلێك مولحید دەبیٚ، بیٚ عەقلیش ئایینی دەبیٚ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بیت پێویستی بە ئەقلێکی لەنگ (عەقلیکی پڕ قەیران )هەیە چونکەئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[1268]، لە(ڕەشنوسیکی تری سالی 1854) دەڵێت مرۆڤی تەواو دەبیٚ دوورە ئاین بێت، ئەگینائەو مرۆڤێکی ناقسە[1269]، واتە بۆ جێبوونەوەی ئاینی لەکۆمەلگە پێویست بە عەقلی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەڵ پێشکەوتنی عەقلە، عەقلی بێقەیران جیگەی ئاینی تیدا نابیتەوە ، رزۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەڵێت: سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقلمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فەلسفەی مادی نابن کە تاکە چارەنوسیانە[1270]، ئەوە لەکاتێکایە کە عەقل و پەیام وبوونەوەر یەکتر تەواو دەکەن ،لە ئاین گرنگی هەرە بنچینەیی بە عقل دراوە ،لەلای هەندی بەشی فقهی عاقل بوون

---

[1267]شبلی عیسمی لە(العلمانیة والدولة الدینیة ص105) دەلیت شیخ محمد عبدەش ئەو بۆضوونەی هەبوە: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل علیه العقل) .

[111] کارل مارکس-بۆس الفلسفه ص256نامەکەی مارکس بۆئینینکۆف.

[1269] مارکسیە قرن عشرین ص145

[1270]المثالیة والمادیة وازمة العصر ص95

بوویته توومەت ،زاراوەی (عەقلانی)بەکار دێنن ،مەترسی لە عەقلانی نیە مەترسی لە بیعەقلی هەیە ، هەروەك قورئان وکتیبە ئاسمانیەکانی تر بە ڕوونی باسیان کردوه .

2- ناکۆکی نێوان کارو نسیب: تیگەیشتنیك بلاوە لە ئاینی ئیسلام کە گوایە خۆماندوو مەکەن رزق وچارنوستان دیاری کراوە ، مرۆڤ مسەیەرە-دەلێن یەکەم جار(وهب بن منه کەتازە ببوە موسولمان لە یەهودیەوە) ئەو پرسەی داهێنا ووتی مرۆڤ مسەیەره[1271] ،لە فەرمودەیەکی زۆر بە ناوبانگ:(..وفي الصحيحين أن النبی (ص) قال(إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً نطفة، ثم يكون علقة مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك، ثم يرسل إليه الملك فينفخ فيه الروح، ويؤمر بأربع كلمات، يكتب رزقه وأجله وعمله وشقي أو سعيد)، ئەوەیان لە ئاینی ڕەت بوە بوویتە کەلتور لە نیو موسولمان کە هەرچی ڕوودەدا دەلێن خوا نوسیویەتی لەوەوە زاراوەی (ئەجەل ونسیب و تەوەکول وبەخت.. وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ..) ، لە لیکدانەوەی بەهەلە والیکدراوەتەوە کە هەرچی دەیکەی سودی نیە هەموی لە پیشتر نوسراوە ،لەو تیگەیشتنەوە ئیمامی شافیعی بە شیعر دەلیٚ:

سهرت أعين ونامت عيون .... في أمور تكون أو لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس ... فحملانك الهموم جنون

إن ربا كفاك بالأمس ما كان ..... سيكفيك في غد ما يكون

لە شیعرێکی تریدا:

وما يك من رزقي فليس يفوتني ... ولو كان في قاع البحار العوامق

ففي اي شيء تذهب النفس حسرة ... وقد قسم الرحمن رزق الخلائ

لە شیعریکی تری وەرگیراو لە (اخبار الدول واثار الدول فی التاريخ) واهاتوة :

جرى قلم القضاء بما يكون فسيان التحرك والسكون

[1271] ابن قرناس-احسن القصص-منشورات جمل-بغداد2010 ،ط1 ص122

جنون منك ان تسعى لرزق ويرزق فى غشاوته الجنين [1272]

به هەمان ئارِستە ئامۆژگاریەکی (ح مسیح) دەلێ بیر لە سبەی مەکەوە ،واهاتوە:(فلا تهتموا للغد.لأن الغد يهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره ..)[1273] ، بەو شێوەیە پاڵ بە مرۆڤ دەنرێ بیر لە بەیانی نەکاتەوە ،لیرەوە عەقل و نەخشەوپلان پەکی دەخرێ ،شارستانی دەوەستێ ،ئەو بۆچوونە پڕ قەیرانە دەپەڕێتەوە بۆ مەیدانەکانی تری ژیانیش ،چی هات لەخواوەیە بۆیە بەرگری مەکە بەلکو سوپاسی بکە ، قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملکوت الله) دەلێ ( عەبدایەتی لەلای خواوە هاتوە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[1274] ، لەلای فقهی ئیسلامیش (ابن عبد ربه) زیاتر لەوە دەیەوێ هاوولاتی بەرامبەر دەسەلاتی دیکتاتۆر سڕ بکاو دەلێ:(اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)[1275]، بە هەمان شێوە ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري: (ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة) . ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەکاو دەلێ(أن السلطان ظل الله في الأرض)[1276] زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەکان ووتراوە 60 سال لە سولتانیکی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بێ سولتان بین ، ئەوە لە بنچینەدا ابن مسعود ووتویەتی وەك لە(عیون الاخبار )هاتوە: إذا كان الإمام عادلاً فله الأجر وعليك الشكر، وإذا كان جائراً فعليه الوزر وعليك الصبر .. بەهەمان ئارِستە ئیمام تەحاوی دەلیت: ولا نرى الخروج على أئمتنا وولاة أمورنا ، وإن جاروا..) ، ئیمام ئیبن تەیمیەش دەلێ: الصبر على جور الأئمة أصل من أصول أهل السُنة والجماعة [1277]...دژایەتی کردنی دەسەلاتی حرام کردوە وداوای کردوە ملکەچی وئۆقرە باشترە لە بەرگری

---

[1272] احمدبن يوسف القارمانى - اخبار الدول واثار الدول فى التاريخ ص10

[1273] كتاب المقدس-العهد الجديد مت(34:6)

[1274] ماركسية قرن عشرين ص146.

[1275] د محمد شحرور-الكتاب والقران ص101

[1276] مجموع الفتاوى ج28/290-291

[1277] مجموع الفتاوى ج28ص179

وفتنه... ئەوانە پشتیان بەهەندیٚ (فەرمووده)بەستوه ، گومان هەیە دروست کراو بن ، چونکە ئەو جۆرە ئارستەیە وای کرد هەتا(لە کوفری بەواحیش)هەلنەستن ئەوەتا خەلیفەی ئەمەوی باوەڕی بە خودا نەبوو،(ولید بن یزید88-126ه) ئەو خەلیفەیەیە ئیبن قوتەیبەوزۆربەی شارەزایان بە بیٚ باوەڕی وەسفی دەکەن[1278]، شیعری هەیە گالتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتیٚ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەلیٚ:

تذکرنی الحساب ولست ادری احقاماتقول من الحساب

فقل لله یمنعنی طعامی وقل لله یمنعنی شرابی[1279]

ئەو تیڕوانینانەی نسیب وبەخت وقەدەر نەك شارستانی دروست نابیٚت بەلکو ژیان دەوەستیٚ ، قەیران لە عەقلی موسولمان لیٚرە دروست دەبیٚت، کە ناکۆکیەکی ڕوون لە ژیانی رۆژانەو ئەو جۆرە بۆچوونانە هەیە ، کاتیٚ ئەو بۆچوونانە دەکریٚتە ئاین یەکجاری قەیرانەکە ئالۆز دەبیت ، وەك ژیانی رۆژانە کەس لەسەر ئەو ڕایە نەوەستاوەونەلەسەر (تفسیری بەهەلەی ئەو ئایەتە)نەوەستاون، هەرکەسە بۆ خۆی هەول دەدا یاسای (هۆو ئەنجام) پەیڕەو دەکا،بەلام بەگشتی ئەو ڕایە کاری لەسەر تیٚکڕای گەشەی عەقلی وشارستانی وتەکنیکی بە سەلبی کردوە، وای کردوە ئاینیەکان زیاتر گرنگی بە ڕابوردوو بدەن نەك داهاتوو، لە بەرامبەریشدا نارەزاییەکی زۆر لەو (متناقظ) هەیە کە مرۆڤ هیچی لەدەستە خۆ نەبیٚت وسزاش بدریٚ،خیام دەلیٚ:

بۆ هەرچی دەچم لەدەستی خوا ڕیشم

هیچ کاریٚ بەدەست خۆم نیەهەرچی دەیکەم

ئەو پیٚمی دەکاهیشتا گوناحباریشم

ابوعلامعری بەشیعر دەلیٚ:(ما ولاحیاتی فهل لی بعدمیلادی ولاهرمی بإختیاری) ، ولیم بلاك( 1757– 1827)بەشیعردەلیٚت ئاین وا دەکا مرۆڤ متمانەی بە خۆی نەبیٚ وئامادە بیٚ بۆ خۆ

---

[1278] ابن قتیبة الدینوری- المعارف –تحقیق: ثروة عکاشة ص366، د محمد عمارة لة(المعتزلة والثورة ص72) بة زةندیقی وةسف دةکا

[1279] د محمد عمارة–المعتزلة والثورة ص72

بەدەستەوە دان ومل چەماندنەوە بۆ زوڵم ، جۆن لۆك كتیبیكی بە ناوی(رساله فی التسامح ـ A Letter Concerning Toleration) یەكیك لەوانە بوو كەلیبوردەیی بەستبۆوە بە دوور خستنەوەی ئاین لە ژیاندا،.. بەشێك بەوەش نەوەستاون تەحەدای خوایان كردوە، ووتویانە ئەگەر هەموكارێك بەدەست ئەوە بابێتە مەیدان وەك لە شیعرەكەی خەلیفەی موسولمانان (ولید بن یزید88-126ھ) گاڵتەجاڕی بە خواو قورئان دەكا و وەلامی ئایەتی (واستفتحواوخاب كل جبارعنید) دەداتەوە ودەلیٚ:

أتوعد كل جبار عنید فها اناجبار عنید

فأن لاقیت ربك یوم حشر فقل: یارب خرقنی الولید [1280]

هەر لەوەشەوە تەحەدای (ح عیسی) كراو پێیان ووت : (..ان كنت ابن الله فقل ان تصیر هذه الحجارة خبزا)[1281] .

3-تەقدیسی ڕابووردوو(ئیستاكوژی مردوو پەرست) : یەكێكە لە قەیرانە گەورەكانی هەر میلەتیك توشی ئەو دەردە ببیت ، مەرجەعی دەبیتە رابوردوو ولاسای وكلاسیك ، لەوەوە دەرگای ئیجتهاد داخرا ،وەلامی پرسیارەكانی سەردەم بە وەلامی كۆن دەدریتەوە كە نابیٚ ،ئەوە یاسای خواییە كە رۆژبەرۆژ عەقلی مرۆڤ زیاتر دەكریتەوە ، بیرو ڕسكانی ئادەمیزاد وا دارِشتراوە تا زیاتر تیٚكەڵ بە یەك بن ئاسۆی بیری فراوانتر دەبیٚت، وەك لەئیمامی عەلی هاتووە: (تەنیا دەفری عەقڵە تا تیٚی كەی فراوانتر دەبیٚت)، زۆر ئاساییە مرۆڤی ئیستا زانیاری زیاتر بیٚت لەمرۆڤی دوێنیٚ ،ئەوەی سبەی لەوەی ئیستا، ئەوە پیٚی دەوتریٚ (تراكم المعرفه) ، ئەوانەی پیشوو پیگەی زانستیان بەهیٚزەو جیٚی ڕیٚزن ،بەلام ناكریٚ ببنە بەدیلی عەقلی سەردەم ،ئەوە لە بواری فكری وفلسفی ڕوویدا،دەیان ووت هەردەبیٚ لەسەر فلسفەی كۆنی ئەرستۆوئەفلاتون برِۆین ،ئەو بۆچونە ئەوروپای وەستاندبوو تا هاتن ئەو ڕیٚسایەیان شكاندو ڕیٚزی ڕابووردوویان گرت و داهیٚنانیشیان بۆ داهاتوو كردو ئەوروپا پیٚش كەوت ،تا وای لیٚهات براتراند راسل بلیٚ ئەگەر فلسفەی كۆن زۆر بەووردی هەلسەنگینین یەك ڕستەی دروستی تیدا نامیٚنیٚ ، ئەوە كەمكردنەوەی پیگەی زانستی فەیلەسوفانی كۆن نیە ئەوە ئاساییە ،جیهانی

---

[1280] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72.

[1281] كتاب المقدس –العهد الجديد،انجيل متى(مت 4: 3 )

ئیسلامیش توشی هەمان دەرد بوە ،گەیشتۆتە ڕادەی ڕیسا دروست کردن(لم یترك السلف للخلف شیئا) مانای وایە زانست بەشی ئیستا نەماوە تەنها لاسایی و دووبارەی کۆن ،ڕێك پەك خستنی بیرکردنەوەیە،ئیستاش کتیبەکانی ئەهلی ئاین زۆربەی کتیبە کۆنەکانە ، بۆیە توشی ناکۆکیەکی کوشندەدەبنەوە، بوونیان لەو واقیعەیەو مەرجەعی وەلامیشیان هی کۆنە ،لەوەوە یارمەتیدەریکی زۆری بەرپاکردنی قەیرانی عەقلی دەبێت .

4-قوولنەبوونەوە لە ئاین: بەشیکی تر لە فتواو بانگخواز تا ئەو ساتەش دەلێن ئاین سادەیەو قوولبوونەوەو تیفکرینی ناوی،پشت بەو فەرمودە دەبەستن کی گوایە پیغمبەر(د خ) نەهی لە (التعمق عن الدین) کردوە ،لەو سەردەمە دەلین قوول بوونەوە لە ئاین توند ڕەوی بەرپا دەکات ..،لە کاتیکا ئایەت وفەرمودەی تر هەیە داوای قوول بوونەوەو تیفکرین دەکا ،بە پیچەوانەوە ئەگەر قوول نەبیەوە توندڕەو دەردەچی وەك (ئیمامی علی)یش دەلیٚ:(لاتری الجاهل الا مفرطا اومفرطا) ( واتە هەردەم جاهیل توندە ،توندیش جەهلە) ، تعمق مانای راسخە ..چۆن دەبی لە قورئان دەلی (والراسخون فی العلم..)ئیمانداره .لێرەش مەنعی دەکا ،کەواتە تعمق توندڕەوی دروست ناکا بە پێچەوانە تعمق نەبوون ئەو دەردەی هەیە ،تعمق نەبوون بەشیکە لە ڕاگرتنی عقلی موسلمان ودروست بوونی قەیران .

5- دابڕاندنی ئـاین: ئـەوەش بـە لێکجیاکردنـەوەی (علمـاو ئومەرا)(سیاسـەت وئاین)(زانسـت وفقــە).. هەموشـــیان لەگــەل دەســەلاّتی سیاســی بەرجەســتەبوو، ( ..ان الکتــاب والســلطان ســیفترقان..)[1282]بەو شێوەیە بنچینەیەکی قوولّی فقهی و دەروونــی بــۆ لێــك جیاکردنــەوەی ئــایین و سیاسەت بەدی دەکرێ. ئیتر زۆربەی زانایانی ئیســلامی کــەمتر بــەلای کــاری سیاســی و دەســەلاّت چوونە، بەتایبەتی لەدوای خۆسەپاندنی (معاویە) و ڕاوەدوونانی زانایان وای لێکردوون کەمیش لەسەر سیاسەت بنووسن، لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دوو هۆی تری سەرەکی وای کـردوە زیــاتر ئــایین لــە سیاسەت و دەسەلاّت دوورکەوێتەوە:

أ- جێی شانازی نەبوونی هەمومیژووی سیاسی خەلافەتەکان لەدوای (راشدین) .

ب- پەیڕەوکردنی ڕێبازی میکاڤیلی لە ڕێبازی سیاسەتی نوێدا..

---

[1282]اخرجة الطبرانی فی الکبیر 20\90 والصغیر 1\264 ...

هەردوولا دیمەنی سیاسەت بە ناشیرین دێتەبەرچاو،تاڕادەی شەرم بوون لەو پیشەیە، سەرلەنوێ زانایەکی زۆر گۆتەی (اعوذ بالله من الشیطان والسیاسة) دەڵێنەوە، تا ئەو ساتەش هێشتا وشەی (سیاسەت) بەناوناتۆرە دەزانن و بەخێرایی ڕەتی دەکەنەوە ،جاروابوە مانای جوینی بەخشیوە، لە نێو کۆمەلگەی عیراقی زاراوەی(بلتیقی) بەکاردەهات وەك جوێن ،مانای(بلتیقە- پڵتیقە) بە مانای(حیلە باز) هاتوە ،کە لەبنەچەدا لە پۆلیتیکی ئینگلیزی( سیاسە -Politico) هاتوە کە مانای سیاسەتە[1283]، پێویستی بە زانیارییەکی مێژوویی و لێك جیاکردنەوەی ڕاڕەوی میکاڤیلی لەگەڵ ڕاڕەوی سیاسەتی ڕەواییە ،سیاسەتی ڕەوا بە (اشرف العلم)وەسف کراوە ، زانایەکی زۆریش کە زانیاری کەمە بانگێشەی (ئایین دوور لە سیاسەت) دەکەن، دەسەڵاتداری عەلمانیش زۆر هاندەری ئەو ڕەوتەیە بە ترغیب و ترهیب، ئیتر گرفتێکە یارمەتیدەری بەرپاکردنی قەیرانی عەقلی موسولمانە .

6-سەرهەڵدانی فرەمەزهەب وفرە تەیار و فرە مەدرەسە و فرە لایەنی ئیسلامی، هەڵبەتە هەر فرەییەك بۆ هێنانەدی یەك ئامانج بێ دەبێتە (بدیل) بۆ یەکتریش، ئیتر ئاساییە ناکۆکیش سەرهەڵدەدا، ئاکامە نێگەتیڤەکانی گەلێ زۆرە ناژمێرێ لە دووبەرەکی و سەرقاڵ بوون بە یەکەوە دەبێتە هۆی وەرگەڕانی پیوەرو ڕاستیەکان ..بەلایەن کەمەوە ئەو ناکۆکیە نابێتە (ڕەحمەت) بەلکو دەبێتە قەیران ، وەك ئیستا و ڕابووردووش قەیران بوە لە نێوان سونەو شیعە ،سۆفی وسەلەفی ،حنبلی و ئەبازی ،لە (معجم المناهی )ئەوناوو وناتۆرانە بۆ سونە ڕیزکراوە (صار النبز بنحو هذه المصطلحات الناقدة من طريقة الفرق لمنشقة عن جماعة المسلمين ، للتنفير منهم ، والحط من أقدارهم ، ومنها :

نبز المعتزلة لأهل السنة باسم : مجسمة ، حشوية .

---

[1283] المعجم الكامل للكلمات والمصطلحات العراقية المادة: بلتيقة

والقدرية يسمون أهل السنة : مجبرة .

والجهمية يسمونهم : صفاتية . مشبهة .

والرافضة يسمونهم : نابتة . ناصبية . عوام .

والكلاميون يسمونهم : علماء الحيض والنفاس ) [1284].

...( موسوعەی بریتانی)یش دەلێ یەکەم جار کیشەی نێوان سونەو شیعە سیاسی بووسەبارەت بە ڕێبەری سیاسی ، بەهۆی دریژە کیشانی بوە تایفیش [1285] ،لەبارەی دریژە کیشان وگەیشتنی بەرۆژگاری ئیستاش عەلی وەردی دەلێ : لە ئەمریکا بووم کاتی عاشورا بوو ئەمریکیەك لێ ی پرسیم ئەو کێشەی نێوان سونە و شیعە چیە هەلبژاردنی نێوان معاویە و عەلیە یان لە نێوان حوسێن و یەزیدە، ووتم ناوەللا ئەوە کێشەی 1400 سال پێش ئێستایە کابراش دایە قاقای پێکەنین!! ، ئەو پێکەنینە سادە نیە گوزارشت لەقەیرانی عەقلی مسولمان دەکات بەتێکرایی.

7- قەیرانی عەقلی تووشی کارو تیگەیشتنی وەهمیت دەکات ،پیلان وتیۆری وەهمیت بۆ دروست دەکا وەك ئیمام علی طۆتۆنی (إياك و مصادقة الكذاب، فإنه كالسراب يقرب عليك البعيد و يبعدعنك القريب).

8- لەگەل ئەو هەموو خزمەتەی (فقە )کردوویەتی کۆمەڵێك خالی لاوازی هاوردووە، لەوانە زۆری و فرەیی مەزهەب، نوێنەبوونەوە ودوگمایی، گرنگی نەدان بە زانست و تەکنۆلۆجیا، نەبوونی مەرجەعیەت و مەرجەعیەتی سیاسی،.. ئەو خالە لاوازانە بەسانایی پەڕینەوە بۆ سەردەمی نوێ، دیمەنێکی دواکەوتەیی و کلاسیکی پێشان دەدا ناتوانێ ببێتە بەدیل بۆ ماکینەکانی عەولەمە،عەقلی موسولمان لە نێوان ژیانی لە عەولەمەوئینتمای باوەڕی بۆ فقهی کۆن تووشی قەیرانی عەقلی دەکا .

---

[1284] معجـــم المناهي اللفظية(ويليه فوائد في الألفاظ ) ص107.

[1285] Encyclopædia Britannica- Article: Sectarianism

*** *** *** ***

لەوانەی سەروو زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێ قەیرانی عەقلی موسولمان بە پیچەوانەی قەیرانەکانی تر قەیرانی لەگەل خودی ئاینەکەیەتی ،ئەویش تێنەگەیشتنیەتی ، ئیمام غزالی لە(تهافت الاسفه)دەلیّ : (عدوّ عاقل خير من صديق جاهل)، هەرلەوەش دیمەنی ئاین بۆ جیهان جوان پیشان نەدراوە ،چونکە زۆربەی تویژینەوەکان لەو عەقلە موسولمانەی پڕ لە قەیران وەرگیراوە .

## وەسفی ئاین لای ئەکادیمیا

( ئیمام غزالي) لە( في إحياء علوم الدين) دەڵێَ: (إن انتشار الكفر في العالم يحمل نصف أوزاره متدينون بغضوا الله إلى خلقه بسوء صنيعهم وسوء كلامهم)لەو بیسەروبەریەی لەسەروو باس کرا وای لە ئاین کرد لەو سەردەمە ڕۆلی پیشڕەوایەتی نەبێت لەزۆربەی مەیدانەکان، بەلکو دواکەوتەو تابع بێت،بەتایبەتی داهینانە زانستی وتەکنیکیەکان زۆربەی جار دیمەنەکان وادووبارە دەبوونەوە یەکەم جار عەقلی موسولمان دژی دەوەستا دوای تەسلیمی دەبوو ،کە چاپ پەیدا لەسالی 1610 یەکەم دەزگای چاپ هاتە نێو مەسیحیەکانی لبنان 70 زانا لە ئەستەنبۆل کۆبوونەوە حرامیان کرد،دوای گوتیان تەنها قورئان نابی چاپ بکری . ، بۆیە درەنگ بلاو بوویەوە تا سەردەمی مەدحەت پاشا لەسالی 1869 گەیشتە بەغدا[1286]، ئیستا چاپ چ ڕۆلێك دەبینی بۆ بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام ، زۆربەی داهینانەکانی وەك (ڕادیۆ ،چوونە ناومانگ، تەلیفۆن، ...)دژی دەوەستان دوای تەسلیمی دەبوون ،تا ئەوساتەش هەندێ زانای ئاینی باوەڕیان بەوە نیە زەمین خڕە لەوانە (بن باز) ،بابوەستین لەسەر دەقی فتوای ئیبن باز لەبارەی دۆخی زەوی و ئاسمان و بەکافر کردنی هەرچی بلێت خڕەو بەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە :

السؤال الثالث من الفتوى رقم (18647) – والجواب لأبن باز

---

[1286] يوسف علي بديوي - 11500 سؤال وجواب –اليمامة-دمشق، ط1 \2005م ص732.

س 3: في درس للعلوم أدرسه: أن الأرض تدور حول الشمس، وحيث إنني سمعت من الشيخ أبي بكر الجزائري: أن الشمس هي التي تدور حول الأرض، وأن من يدرس هذه المادة يجب أن يخاف الله، وأن هذا خطر على عقيدته، حيث إن هذا الأمر يكفر صاحبه، فقد قمت بعد أداء الدرس بتوضيح ذلك للطلبة، فهل هذا الأمر صحيح أم أنني مخطئ في ذلك، أفيدوني أثابكم الله وجزاكم عنا كل خير.

ج 3: ما قاله الشيخ أبو بكر صحيح، فإن الأرض ثابتة قارة، والشمس هي التي تدور حولها، كما قال الله عز وجل: {اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا} وقال سبحانه: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا} وقال في الشمس والقمر: {كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى} ومن قال: إن الأرض هي التي تدور، وأن الشمس واقفة فهومكذب للقرآن،وتكذيب القرآن كفرأكبر،نسأل الله العافيةوالسلامة، وبالله التوفيق، وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم[1287].

له بنهچەدا بیرۆکەی زەوی ناوەندی گەردوونەو خۆرو ئاسمان بەدەوری دەسوڕێنەوە بیری ئیسلامی وئاینی نیە ، بیری پەتلیمۆسی یۆنانی دەگەڕێتەوە کەلە بنەماکانی (مەجەستی)تۆماری کردوە،پەتلیمۆس گۆتی ئەگەر زەوی بسوڕابوایە کەس لەسەر زەوی خۆی ڕانەدەگرت ودەکەوت، ئەرستاخۆس وفیساگۆریش دیارە ئەوڕایەیان هەبوە[1288] ، دوای بوەبەشێك لە عەقیدەی مسیحی لەسەر دەستی قەشە(تۆما ئەکوینی )،بەلام نازانرێ چۆن هاتە نێو ئیسلام بە تایبەتی بەشی فقهی دەگۆترێ یەکەم جار لەسەر دەستی موعتەزیلە هاتۆتە نێو عەقیدەی ئیسلامی، بەتەواوی نەبوەبەشێك لە عەقیدەی ئیسلامی بەهۆی قایل نەبوونی بەشیك لە فەیلە سوفان لەوانە کندی وغزالی وابوعلای معری اخوان الصفاو[1289] ،بەلام بالی فقهی بەتەواوی کەوتە نێوبۆچونیکی تری گەردونی ئەویش (چەسپاوی زەوی ) وسوڕانی ئاسمان ،لەوبارەیەوە (ابو حسین بن المنادی ) دەلێت:

---

[1287] لە کتێبی(مجموع الفتاوی ج9ص228 ،لە فتوی ژ:15255 زانایانی تر(عبدالعزیز ال شیخ- صالح فوزان-عبدالله بن غدیان-ابن باز) هەمو فتوای ئەوەیان دا ئەوەی بلی زەوی دەسوری کافرە ،دوای لەوەی پشیمان بۆوە ووتی نابتە کافر بەلام دژ بە ئیسلامە.

[1288] بۆ ڕای ئەو فەیلەسوفانە سەبارەت بە سوڕانی زەوی بڕوانە : الموسوعة المشاهیر ص12

[1289] من رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم 26ص30، موفەکیروشاعیریکی وەك ابوالعلا المعری کەناوی بەمولحید ڕۆیشتوە کەچی باوەڕی بە (قدم العالم)نەبوە وەك لەودیرە شیعرەی دەردەکەوی: ولیس اعتقادی خلود النجوم ولا مژهبی قدم العالم

(لاخلاف بين العلماءفى ان الارض مثل القبة وان العالم مثل الكرة وانهاتدوربمافيها من الكواكب ثابتين غيرمتحركين ،احدهما فى ناحية الشمال والاخر فى ناحية الجنوب كرو الارض مثبتة وسط السماء كالنقطة من الدائرة)[1290]، له ناو شيعەش هەندی زانایانیان ئاوا وەك ئەوانەی سعودیە بەهەلەداچووینە، لە(شرح أصول الكافي - مولي محمد صالح المازندراني - ج 1 - ص 17) [ شرح المقدمة ] ونصلي على سيد أنبيائك وأشرف أوليائك صلاة دائمة ما دامت الأرض ساكنة والفلك دوارا ....

دوای عینادیەکی زۆر لەلایەن ئەو جۆرە فەقیهانە ناچار تەسلیمی ئەو ڕاستیە دەبوونەوە بەدرەنگەوە ، بۆ ئەو ڕەوشە (ئەنجلس )دەلێ : (خوا چەندە بە دەست نەزانی لایەنگرانی خۆی ماندووبوە، وەك(فریدریك ولیامی سێیەم)ی لیهاتوە چۆن ئەویش بەدەست جەنەرال و سەرکردە عسکریەکان قەلا بەقەلا دەیان دۆڕاندو چەکیان دادەنا، لایەنگرانی خواش بەرامبەر زانست ئاوا وا دەدۆڕێنن)[1291]، دیفید میلز لە کتێبی ( atheise univers ) لە بەشی یەکەمی دەلێ ئەگەر کتیبی پیرۆز زۆر بەووردی وزانستیانە بخوێنیەوە یەکسەر بێ باوەڕ دەبی ، یەکی تر دەلێ کنیسە ببوە ناوەندی بەرپاکردنی مولحیدی[1292].. ریتچارد فاینمان(فیزیا زانی ئەمریکی) دەلیت ئیمە ئامرازی وامان دروست کردوە هەمو نهینیەکمان بۆ ئاشکرا دەکا چی تر پیویستمان بەوە نەما بلێین ئەوە خوا دەزانی ، جاران نەخۆشیە دەروونیەکانیان دەدرا پالّ شەیتان و جن یان (غەزەبی خوا) لە نیو مەسیحی وایان دەزانی کە شەیتان سەرچاوەی نەخۆشیە بەتایبەتی دەروونیەکان[1293]، بۆیە کە پزیشکێکی یۆنانی کۆن ووتی نەخۆشی (سەرع —خوو) پیرۆز نیەو پەیوەندی بەخواو شەیتان نیە بوە کیشەیەکی گەورە[1294]، تا ئەو دواییەش لەکوردستان شەوانە پاسەوانیان بە دیار مندالی لەدایك بوو

---

[1290] اخبار الدول واثار الدول فى التاريخ- احمدبن يوسف القارمانى ص25

[1291]ديالكتيك الطبيعة ص230 .

[1292]الفيزياء والوجودالخالق ص25

[1293]كتاب المقدس-العهد الجديد4 اتحادجمعياتالكتاب المقدس-جدول الشروح ص719

[1294]المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص59 لەو کتیبە باسی سەردەمی ئەو پزیشکەی نەکردوە بەلام وا پیدەچی لە چین یان هند بێت.

دەگرت گوایە (شەوە) دەیبات وچەندین چیرۆك وسەربردە دەگێردراوە گوایە بە چاوی خۆیان بینیویانە، چەندین پشیلەی بەستەزمان دەکوژرا گوایـە شـەوە بـە شـیوازی پشـیلە دیتـە ژوورەوە،دوای دەرزی گزاز(tetanus)دۆزرایەوە پرسی(شەوە) هەر نەما، جاران چارەی پزیشکی ودەرمان بێئـاینی ولاوازی بڕوا هەژماردەکرا، دەیان ووت هەموی لای خودا دێت ، هەمو ئەوانەش ئەسلی دەقی نیە ،زیادەیە لە ئاین،بەرژەوەندی هەندێ شیخ ونوشتەچی وپیاوی ئاینی چەوسینەرە، زیاتر لەوەش ڕەچەلەکی ناڕاستی هەیە ، جاران (شادراپا) خوای شیفای نەخۆشی بوە پیویستی بە دەرمان وئەسباب نەبوە ،شیرنۆبۆگ خوای سلاڤیەکان بوە بـۆ شـەرو بـەخت خراپـی و (خواوەنـدی رەش)لەبەرامبـەر (خواوەنـدی سـپی) ،(شیڤا) خواوەندی هندۆسیەکان بوە ئەو بەرپرسی کارەسات بوە[1295] ، کاتێ زاناو فەیلەسوف دژ بەو هەنگاوە دەوەستان ناووناتۆرەی کافرو مولحیدیان لینراوە،بۆیە دەبێ ئاگاداربین لەو توومەتانـە گـەلێ جار پێچەوانەیە،لەوەوە ڤۆلتێر شانۆگەریەکی لە پاریس کـرد بـە نـاوی دۆزەخ وبەهەشـت لـەکۆتایی شانۆگەریەکە هەرچی قەشەو پاپا وپیاوی ئاینی بوو خوا ڕەوانەی دۆزەخی کردن مولحیدەکانیشی بردە بەهەشت،هەر لەسەر ئەو بنچینەیە (بلوخ) کە بە مولحیـدێکی ئـاینی نـاوزەد کـراوە دەڵێ:(مولحیـد مەسیحی ڕاستەقینەیە،مەسیحی ڕاستەقینەش مولحیدە)[1296] ...

واتە ئاین نەك بوە چارەسەر بەلکو بوە بەلایەکی وا کە خانەنیشینی بکەی قازانج بوەو وەك بەشێك لە لیبوردە، جۆن لۆك کتیبیکی بە ناوی(رساله فی التسامح ـA Letter Concerning Toleration) یەکیك لەوانە بوو کەلیبوردەیی بەستبۆوە بە دوور خستنەوەی ئاین لە ژیاندا،ولیم بلاك(1827 - 1757) لە شیعرێکی هاتوە کە ئاین وا دەکا مرۆڤ متمانەی بە خۆی نەبێ وئامادە بێ بۆ خۆ بەدەستەوە دان وملی چەماندنەوە بۆ زولم،دەلێ ئاین لەگەل سروشتی مرۆڤ ناگونجێ ومولحیدی زیاتر گونجاوە ،لەو سۆنگە قوولەوە وەسفی زۆر خراپی ئاین کراوە ،وا هەندێکی تۆماردەکەین:

- تایلر: ئاین لە گیانە عفریتیەکان هاتووە.

---

[1295] قاموس الخرافيات ص153

[1296] الماركسية والدين ص7 .

- سپنز: له چیرۆکی مردووەکان هاتووه.

- کوندریت مولر: له ترسی کارەساته سروشتی یەکان هاتووه.

- بزر: له مەزنی سروشت هاتووه کۆتایش دێت به کۆنترۆڵ کردنی سروشت .

- فرۆید: له پشیمان بوونەوەی باپیره کوژراوەکەیان هاتووه.

-ج سنتیانا(1863-1952)ئاین له شیعرو پەخشان وئەفسانه هاتوه بەگەشەی زانستی سروشتی هەمو ئەو ئاینانه لەناو دەچێ .

-جیسف انتورا: الدين هو عكاز لذوي العقول الضعيفة.

(41)

**قەیرانی عەقلیەتی کوردی** ازمه عقل الكورد the kurdish mind risis

**ئەوانەش دەگریتەوە (عەوام ، کۆڕا، کاربۆناری ، پاستکی،..)**

خودی عەقل قەیرانی نیە ،بەلام لە بەر بەربلاوی ئیمەش لیرەدا بەهەمان چەمك وەری دەگرین و ناومان ناوە (قەیرانی عەقلی)،لەلایەکی تریشەوە عەقلیەتی کورد تەواو توشی ئەو قەیرانە نەبوە ، زیاتر قەیرانی داهێنانی هەیە ، داهێنان وبەرپا کردنی شارستانی(هزر-زانست-تکنیك –یاسا) لەکوردستان لاوازبوە ، چونکە فقهی مەزهەبی کوردی گرنگی بە شارستانی نەداوە ، بۆیەش نەبوویتە ڕای گشتی وایان زانیوە ئەوە ئەرکی غەیرە دین وغەیرە کوردە، لەسەردەمی ئەزمونی دەسەلاتی کوردی زیاتر ئەو دۆخە تۆخ بوو ،لە ڕاستیدا ئەگەر عەلمانیەکان بەهۆی کاریگەری وپاشکۆیەتیان بۆ لایەنی سەلبی عەقلی رۆژئاوایی و ئیسلامیەکانیش سەرسام بوون بە عەقلی عەرەبی دەتوانین بلێین عەقلی کوردی بەرەو قەیرانە .

ئەگەر باس لەوە بێت کە عەقلی کوردی تەواو بڕناکات وزانیاریەکانی کورت هەلدێنیٚ ودلۆپپیکە لەدەریا، ئەوە قەیرانی عەقل نیە بەلکو قەیرانی زانیاریە هەمو مرۆڤایەتیە،قەیرانی سنورداری عەقلی گشتیە کە لە سنورداری هەستەکانەوە دێت ، ئەوەی تایبەتە بە کورد زیاتر پەیوەندیدارە بە بارودۆخە سایکۆلۆجی وفەرهەنگ ، بەهۆی تایبەتی توشی دەردی خۆ بە بچوك زانین وشەرم ی ئینتمایی و(دەردی تەقەزوم بوون) وا دەکا قەیرانی عەقلی دروست بێت ، قەیرانی عەقلی کوردی وەك پێناس و سروشتی قەیرانی عربی نیە ،لیرە قەیرانیکی دەماودەستە ئەو قوولاییەی نیە ، بۆیەش وەك عربی لەسەری نەنوسراوە ، زیاتر بەهۆی داگیرکاری وشکست بۆی پەیدا بوە ، ڕەنگە بەشێك بێت لە هۆکاری دواکەوتەیی عەقلیەتی میلەتانی داگیرکراو ،کە داگیرکەر هۆکاروهاندەریەتی ، بەلام ئەو سەردێرە دەکەینە چەمك تا برایانی عرب واهەست نەکەن ئەو پۆلینە بۆنی ڕەگەزپەرستی لیٚبیٚت، یان

بوار بدرێت توومەتی شعوبی بدرێتە ئەو تویژینەوە چەمکانە، بۆیە چەمکی (قەیرانی عەقلی کورد)بەکار دەهێنین ئەگەر چی نەگەیشتبێتە ئەو پلەیە لەقەیران ،ئینجا بۆ سانای گوزارش کردنیش .

## قۆناغەکانی گەیشتن بە قەیرانی عەقلی

ئەو قەیرانە لەدوولاوە دروست دەبێت ،یەکەمیان ناوەکیە کە سروشتی خودی عەقل ئەوەیە فاکتەری دەرەکی پێویستە بۆ تەواوی گەشەکەی[1297]، جا ئەگەر ئەوفاکتەرە دەرەکیە ساغ نەبوو لای دوەمی قەیرانەکە تەواو دەکا .

ئەو دەردەی دەرەکی لەناو هەر میلەتێك بە دەروازەیەك دێتە ژوورەوە ، عادەتەن لە ئەنجامی کەلەکە بوونی شکستی زانستی وسیاسی وکۆمەلایەتی وسەربازی دێت ،دوای دووبارەبونەوەی ئەو شکستانە دەگاتە قەیرانی فەرهەنگی ، کەلەکۆمەلێك قەیرانی تر دێت : قەیرانی زانیاری وزانست،قەیرانی هزر، قەیرانی سیاسی،قەیرانی شارستانی..کە ئەوەیان پەیامی ئاسمانیشە ووەردەچەرخێ بۆ قەیرانی ئاینیش(واتە تیگەیشتنی دروست بۆ ئاین).

ئەودەردەی قەیرانی عەقلی ئەو کاتە زیاتر بەرجەستە دەبێت کە بەریەك کەوتنیك لەگەل عەقلی تر دروست دەبێت، یەکسەر دواکەوتەییەکەی دەردەکەوێت، ئەوکاتی عەقلی تووشی قەیران دەبێت یان تووشی لاسایی و سەرسامی دەبیت پێیان، لە باری یەکەما لەبەر نەفامی ڕەتی دەکاتەوە لە چوارچێوەی(ماناقشنی الجاهل...) وزیاتر توشی دوگماو داخراوی دەبێت ، لە باری دوەما تووشی توانەوەی عەقلی دەبێت ودەبێتە لاسایی کەرەوە ، لەکۆتاییدا دەردی خۆ بەبچووك زانین و لێ بەرهەمدێت، ئەوسا هەردەم عەقلی خەلکی تری پێبەهێز تر وشارەزاتر دەبێت ،متمانەی ناوەکی زۆر لاواز دەبێت ،تا ئەو ڕادەیە بیرو هزری خۆی ڕابگرێ ،کەسایەتی وسایکۆلۆجیەتی ئەوتاکە (یان ئەوکۆمەلگەیە) لەدۆخێك دەبێ هەردەم سەرسامەبەهەلویست وفتواوڕێبازوکاری بیانی،کاروداهینانی خۆمالی لابچوك دەبێتەوەوئەوەی خەلکی تری لاگەورەدەبێت، لەوەوەکۆمەلگەیەکی لاسایی کەرەوەمان بۆدروستدەبێت بێداهێنان ،ئەوە دەروازەی چوونە قۆناغی قەیرانی عەقلە .

---

[1297] بۆ زیاتر لەو بارەیە بڕوانە : رەوشی فلسفی سەدەی 21-تویژەر.

**هۆكاری قەیرانی عەقلی :**

چەند هۆكاریكی ئالۆز لە عەقلی كوردی كۆبوویتەوە وای لێكردوە بەرەو قەیران بچێت، خۆلادان لە ئاینی ڕەسەن وپابەند بوون بە هەندێ مەزهەبی فقهی دۆگما ، ئەوە لەلایەك لەلایەكی ترەوە دووچاری داگیركاریكی وابوە ئامرازی دەولەت بەكار دەهێنێ بۆ دواخستنی عەقلی ،كۆمەلگەی كوردەواری نزیكەی سەدەیەكە دووچاری داگیركاری وشكست بوویتەوە لە ڕووی نیشتمانی وسەربازی وسیاسی وفكری ،ڕەنگی داوەتەوە سەر شكستی شارستانی وتەعلیمی ،ئەو شكستانەش وائاویتە دەبن كە دەردەكە بگاتە ئاستی فەرهەنگی كۆمەلگەی كوردەواری كە دوا سەنگەری بەرگری كەسێتی كۆمەلگەیە ، هەڵبەتە ئەو دۆخە ئاسایی نیە بەدەگمەن لەنێو گەلانی جیهانی تر نمونەی وا هەبێ، ئەوەش كۆمەڵێك هۆ و پاساوی خۆی هەیە، گرنگ ترینیان ئەوەیە لەدوای مەینەتی كورد لە 1908 بەدواوە شكست لە كرۆمۆسۆمەكانی تاكی كورد گیربووە،كەمتر متمانەی بەخۆی ماوە،ئەوە دەردی میلەتانی ژێر دەستەیە ، كاریگەری سیاسی و دەروونی و فەرهەنگی قووڵی بەجێ هێشتووە، بۆیە لای كۆمەڵگەی كورد وادەركەوتووە هەرچی لەدەرەوەی كورد بێت مەزن و گرنگ و پتەو بەچارەنووسە، هەرچی لای خودی كوردیش بێت بچووك و دەڤەری و لەرزۆك و بێچارەنووسە، تا وای لێهاتووە شەرمی پێبێت، بۆیە دەبینین ئینتمای نیشتمانی و نەتەوەیی و ئاینی و فەرهەنگی لاواز بووە، بەخێرایی دەگۆڕێن، بەخێرایی جل وبەرگ و دیمەنی خۆیان دەگۆڕن، زمان و نەریتیان دەگۆڕن، نەتەوەیان گۆڕی، هەتا ئاینیش دەگۆڕن.

ئەوەیە (قەیرانی فەرهەنگیە)، هەربۆیە دەبینین هەتا ئەو ساتەش هیچ تەیار و مەدرەسەیەكی عەلمانی نادۆزیەوە لەسەر ڕێبازی زانا و ناودارێكی كوردستانی بێ، بۆیە باسی كەلتوور و نەریتی كوردستان بەنێگەتیڤی دەكرێ، خۆ لە فكر و فەلسەفە و تیۆری سیاسی بەتایبەتی لە ماركسیەت،بەهۆی دەردی فەرهەنگی وقەیرانی عەقلی دان بەیەكتر نانێن،هەریەكە سەرسام دەبیت بە ڕێبازێكی بیانی ناتەبا لەگەل جەوهەری ریبازی كوردستانی .

ئەو دەردە ئەوەندە کوشندە و خەستە تارادەیەك بەشێکی ئیسلامیەکانیشی گرتۆتەوە، زۆربەیان لە گفتوگۆ پاڵپشت دەکەنە سەر زانایەکی غەیرەکورد،هەروەها ڕەچەڵەکی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی کوردستان دەدەنە پاڵ ئیخوان یان فکری بیانیەك ،کەچی دەتوانین بڵێین ئیسلامی سیاسی (بەزاراوەی باوی ئیستا)یەکەم جار لە کوردستان لە سەر دەستی نەورەسی سەری هەڵدا، هەمو ئەو بارودۆخە فەرهەنگیە وادەکا داهێنانت نەبێ تەنها لاسایی کەرەوە بیت ،پاشکۆ بیت ولەگەل دووبارەبوونەوەی وەردەچەرخێ بۆ قەیرانی عەقلی .

کۆمەڵگەی کورد ڕاستەوخۆ لەو دەردە بەرپرسیار نیە، بەڵکو مونەزیرەکانن،ڕەوشەنبیرەکان و تا دەگاتە سەرکردەکان هەروەك لە ئایدیۆلۆژیای حزبە کوردستانیەکان دەردەکەوێ کە لە خوارەوە زیاتر ئەو بابەتە ڕوون دەبێتەوە .

## قەبارەی قەیرانی عەقلیەتی کورد

قەیرانی عەقلیەتی کوردی یەك سەرچاوەی نیە سەرەکیەکەی دووانە ، لەدووچینە پیشڕەوەکانی کوردستان دێت ،کەلەو دەمە یەکەمیان عەلمانیەو دوەمیشیان ئیسلامیە، ،بەشی هەرە زۆری عەلمانیەکان زیاتر پاشکۆی لایەنی سەلبی رۆژئاوایین ، بەشێکیش لەئیسلامیەکان پاشکۆی عەقلی عەرەبین کە خۆی لە قەیراندایە ،عەقلی عەرەبی لە ژێر ئینتدابە واتە ئەو عەقلە کوردیەی کەوتۆتە ژێر ئینتدابی ئینتداب ،ئەو دۆخە زۆر تایبەتەو پێی دەووترێ(**پاستکی**—pastich) بەوانە ووتراوە لاساییکەران[1298]، ئەگەر هەردوولایان(عەلمانی وئاینی) بەهۆی جیاو لەڕێی جیا تووشی لاسایی و تەبەعیەت بوون ئەو دەردە بە دووبارەبوونەوەوچارە نەبوون وەردەچەرخێ بۆ قەیران ،کاتێ کاریگەری داگیرکەر نامێنێ ودەبێتە دەسەلاتی کوردی وئەو قەیرانەش چارەسەرنەبێ یان بە ئاڕستەی پیچەوانە ڕەو بکا ئەو کاتە مانای (قەیرانی عەقلی کوردی)وەردەگرێ ، بۆیە لەسەر هەریەکە تەوەری ئیسلامی وعەلمانی دەوەستین :

<u>یەکەم – تەوەری ئیسلامی</u>

---

[1298] معجم مصطلحات عصر العولمة ص84 .

لەبەر ئەوەی عەقلیەتی کوردی زیاتر لە ژێرکاریگەری ئاینی بوە ئەوە هەر لەنگیەك ڕوبەڕووی ببێتەوە لە ئەنجامی بۆشایی ئاینی دروست دەبێت ،ئەو عەقلیەتە ڕاستەوخۆ بە پرۆسەیەکی ئاینی نەخەملیە،بەلکو لەڕێی فقهـ بوە ، ئینجا سەرەڕای قەیرانەکانی فقهی(کەلە پیشوو باس کرا) ئەو فقهەی زۆرینەی کوردگرتیتیە بەر کاریگەرە بە نەریت وکەلتوری عربی ،عەرەب وفقهـ پێکەوە لەقەیران دەبتە سەرچاوەیەکی سانا بۆ قەیرانی کوردی،کەواتەقەیرانەکە لەوە دێت کە ڕاستەوخۆلەگەل عەقلی ئاینی کاری نەکردوە بەلکو لەڕێی عەقلی عربی چوویتە نێو ئاین ،واتە قەیرانی عەقلیەتی کوردیش وەك باقی قەیرانەکانی تری میلەتانی موسولمان ئاین بۆی دروست نەکردوە بەلکو لە تێنەگەیشتن لێی دروست بوە ، قەیرانەکەشی زۆر سەخت نیە،چونکە ڕیشەی میژوویی نیە،زانایانی ئاینی کورد کەمتر ئەو قەیرانەیان هەبوە ،ئەوەی تووشی ئەو قەیرانەش بووبێت کەمتر لە کوردستان دانیشتوە،بۆیە کاریگەریەکەی بەسەر کۆمەلگەی کوردی زۆر نەبوە،ئەو دیاردەیە نوێیە دەتوانین بلێین هەم ئیستا سەرەتایە هەم کۆتاشە ،سەرەتایە چونکە ئیسلامیش وەك عەلمانی کەوتە لاساییکردنەوە ،دەردی ئیسلامی وئاینپەروەری مۆدیرن هەر هەموی لەوە کۆبوویتەوە کە عەقلی عەرەبی کردۆتەوە تەوەر ،فلتەر، زانیاریەکان وکتیبەکانی مەکتەبەی بریتین لە نوسەرانی عەرەب، هەر میلەتێك بەو عەقلە کاریگەر بێت ئەویش لە قەیران ودواکوتندایە،نمونەی ڕوون پاکستان وئەفغانستان وتاڕادەیەکیش کوردستان،دەبینین باقی وولاتانی ئیسلامی کە عەقلی ڕاستەوخۆ تەفاعول لەگەل ئاین دەکا لەگەشە دایە ، یان وورد تر لەو قەیرانە رزگاری بوە،میلەتی کوردو ئەفغان وپاکستان لە ڕێی عەقلی عربیەوە تەفاعول لەگەل ئیسلام دەکا کەوتونە نێو قەیران وپەرتەوازەیی ودوا کەوتن .

عەقلی عربیش خۆی لە گەورەترین قەیراندایە وەك لەسەروو باس کرا ،هەروەك قەیرانی عەقلی عەلمانی کورد لەپاشکۆیی و لاسایی کردنەوە دێت ئاواش ئەو بەشەی ئاینپەروەر وئیسلامی لاسای وتاڕادەی پاشکۆیی عەقلی عربی دێت،کیشەکە بەوە زیاتر ئالۆزو ئاویتە دەبێ کە قەیرانی عەقلی ئیسلامی کوردستان لە ژێر کاریگەری قەیرانیکی تری سەختی عەقلی عەرەبی قەیراناوی بێت،عەقلی عربی لەو کاتە توشی قەیران بوە کە ویستویەتی عروبی وئیسلامی تیکەل بکا،ناشکرێ، چونکە عروبی لە کۆمەلە فاکتەرەکانی ستونیەو ئاینیش لە کۆمەلە فاکتەرەکانی ئاسۆییە،ناچار دەستکاری

دەقی دەوێ ،لە ئاینیکی مرۆڤایەتیەوە وەری چەرخێنە ئاینیکی ڕەگەزپەرستی، ئاینیانی کوردستان تەسلیمی ئەو دەستکاریانە بووینە وەك بەشێك لە ئاین .

زۆربەی بیریارەگەورەکانیان کۆدەنگن(هەریەکە بە جۆری خۆی) لەسەر ئەو شەبەنگە قەیراناویەی عەقلی عربی، بەرهەمی عەقلی عربی ئاینی لەو زەمینەوە (تصدیر)ی بۆچوونەقەیراناویەکانی دەکا،بەشیکیشی هەیە لەو قەیرانانە رزگاربوە،بەلام کەمایەتین وهەولی نامۆکردنیان دراوە بە زیندانی کردن و دوورخستنەوەو سزای تر، کەچی ئیسلامی کورد وەك چۆن عەلمانی کورد لاسایی لایەنە سەلبیەکانی مەدرەسە عەلمانیەکانی جیهان دەکاو توشی قەیرانی عەقلی سەخت بوە، ئاواش بەشی هەرە زۆری ئیسلامی کورد کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جۆرە عەقلە پڕلە قەیرانەی عەرەبی، ئاینپەروەری کورد ڕازی بوە لەدوای ئەو عەقلەی عربی جێی خۆی بکاتەوە ،کەچی عەرەبی ئیسلامی بە پلە دووی موالی کۆن سەیری ئیسلامی کورد دەکا ، تەنانەت بە خۆی ئەو هەمو قەیراناویەی بەئیسلامی کورد دەلیٚ تۆ بیرمەکەوە عەقلی عربی بەهیزترە(وەك لە فقهی ئیمام ئیبن تەیمیەو...) من لە جیاتی تۆ بیردەکەمەوە ،تۆ تەنها لە خزمەتدابەو بەدوام کەوە،من چیم پیٚ باش بوو ئەو بۆ تۆش باشە،ئەگەر هەلەشم کرد ئەوا هەلەی من لە ڕاستی تۆ دروست ترە ، بەو ڕوانگەسەقەتە ئیسلامی کورد سەیری جیهان دەکا،چاوەڕیٚ دەکا عەقلی عربی وێنەی دونیای بۆ بکێشی،دەریش کەوتوە ئەو وینانەی عەقلی عربی دروستی دەکا زۆر لەنگ وسەقەتە، وێنەی ڕاستەقینەی جیهان نیە (إياك و مصادقة الكذاب، فإنه كالسراب يقرب عليك البعيد و يبعدعنك القريب)،لەوەوە ئیسلامی کورد تووشی کاردانەوەی تایفی وتوندی ودەمارگیری ودابڕان وبیٚ ئینتمابی بوە بیٚ ئەوەی پیویستی پێبێت،تووشی وەهمی بوونی پیٚلان دەبێت ، جاروایە هەمو دنیای لیٚ دەبێتە دوژمن، تاجل و بەرگی خۆشی بیٚ ئەوەی هۆیەکەی مەعقول بێت،کە شایستەی نیە،بە دلپاکی وفەقیرحالی تووش دەبیٚ ، جاریش وایە دەگاتە ئەو ڕادەیەی تەرازوو وپیوەرەکان پیچەوانە دەکەنەوە دۆستی لێدەکەنە دوژمن ،سپی لیٚ ڕەش دەکەن ..بە پیچەوانەشەوە ، شیخ سعیدی و شیخ محمودو مەلامستەفاو تەواوی دۆزی کورد دەدەنە پالٚ پرۆژەی ئیستعمارو زایۆنی و وولاتانی عربیش پیشڕەوی رزگاری وهەلگری ئالای ئاین ،شۆڕشەکانی کوردستان ئینفسالی وئینگلیزی وروسی بوە کەچی شۆڕشێکی خیانەتکاری وەك

شريف بن حسين به (ثورة العربية الكبرى) وەسف دەكەن ، ئيستا عەقلی عەرەبی دواكەوتو ترين عەقلە لە جيهان تا ئيستا ناتوانیٚ دەرزيەك دروست بكا ،كەچی ئاين پەروەرانی كورد موعجيبە بەو عەقلە قەيراناويەو دەيەویٚ مندالی كورد لە ژێر سايەی ئەو عەقلە پەروەردە بكا ،...

ئەو دەردە سونەو شيعەی كوردی گرتۆتەوە هەريەكە بە جۆرێك، لە سونە فەزلی عەرەب بەسەر گەلانی تر یەک لە ئەسلە عەقیدەییەکان بوە ، لە شیعەش فەزلی سەید بەسەرخەلکی تر هەمان دەردە.

**هەرچەندە زۆر میلەتی تر(وەك فەزلی عەرەب)فەزلیان بە خۆداوە،** فەزلی یەهود وفەزلی لاتین ورۆم وفەزلی فارس و..زۆرلەو جۆرەتیۆرە ڕەگەزپەرستیە دوور لە ئاین هاتۆتەکایەوە،سەرەنجامەکەی تەوژمی نازیەتی ئەلمان وفاشیەتی ئیتالیاوشۆڤینیەتی فرنسی وڤالانژیسی ئیسپانی تۆرانی تورکی وزایۆنی یەهودی وبەعسیەتی عربی لیٚ پەیدابوو، فەزلی عەرەب دژە لەگەل قورئان وفەرمودە،لەکاتێکا لە (١١)شوێنی قورئان باسی (اعراب)ی کردوە.. تا دەگاتە (الاعْرَابُ اشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً ..) ،کەچی ئەو جۆرە مەزهەب وئیمام وزاناوموفتیانە بە پێچەوانەی ئەدەبیاتی قورئان لەیەک شوێن بە(ئەعراب) ناوزەدیان نەکردوون، بەلام نوسینەکانیان پڕە لە(اكراد واتراک واعاجم) ،

ئەو پرۆسەيەو كاريگەری نيشتمانيەكانی كەم بوە پيشووتر، تا دەگاتە سەردەمی ناشيۆناليزمی وپرسی نەتەوەيی ، لەو كاتە كوردخراوەتە ژێر دەستی عەرەب كاريگەری نيشتمانی زيادی كردوە ، ئەوەی دەبێتە دەروازە بۆ قەيرانی عەقلی كوردی ئەوەيە: ئەو دۆخە دژە لەگەل ئاين لەگەل بنەمای مرۆڤايەتی لەگەل ئاسايشی نەتەوەيی كورد كەچی زانايانی ئاينی كوردستان بوێری ناكەن دەستكاری بكەن بە پالپشت بە ئاينی ڕاستەقينە .

زاناو فقیهی عربی بەناوی (نسخ)جورئەتیان کرد حوکمی ئایەتی قورئان ڕاگرن،بەناوی(فەرمودەی مەوزوع) عەرەب وفارس و میلەتانی تر..توانیان بەسەدان فەرمودە دەربکەن ،کەچی زاناو ئیسلامی کورد تا ئەو ساتە جورئەتیان نیە دەستکاری فتوایەکی چەوتی فقهی بکەن.

**قەيرانی تر:** لە قەيرانی عەقلی عربی باس لە كاريگەری سايكس پيكۆو بەلينی بلفۆرو كۆمەليك هۆكاری تری درا ، بەشێك لەوانە هەمان زەمينەی قەيرانە بە تايبەتی دابەشی كوردستان

وداگیرکردنی لەلایەن ئیستعماری غەیرە دین، دوای قۆناغیکی تر دێت بەردەوامی ئەو مەینەتیەی کورد لەلایەن برای دینی خۆی ،لێرە قەیرانە عەقلیەکە بۆ عەلمانی وئاینی کورد دروست دەبێت بە ئالۆزی، کاتێ عەلمانی هەردوو قۆناغ دەداتە پاڵ ئیسلام وبە بەرپرسی دەزانی لە مەینەتی کورد،ئەوکاتەش کە ئیسلامی هەردوو قۆناغ دەداتە پاڵ ئیستعماری غەیرەدین،هەردوولاش هەڵەن ،بۆیە ئەو (تێکگیرانە)بەردەوام نابێت هەردوولا تووشی جۆرە قەیرانیکی تر دەبنەوە ،لەعەلمانیا دەردەکەوێ کە ئەو بانگیشەی بۆ مدرسە علمانیەکان(سۆشیالیستی –لیبرالی-شیوعیەت-ناشیۆنالیزمی)کراوە بەرپرسن لەو مەینەتە(دوای باسی دەکەین) ، لەوەی ئیسلامیش دەردەکەوێ قۆناغی دوەم وبەردەوامی مەینەت لە ئەستۆی برای دینی و وەبگرە برای مەزهەبی خۆیەتی ،کە لێرە زیاتر باسی دەکرێت .

لەسەر ئەوبنچینە موسوڵمانی کورد ڕووبەڕووی چەند پرسیارێك بوویتەوە وەلامی زەحمەتەو عەقلی ئاینیەکەی بەرەو قەیرانیکی سەربازدەبات ،گرنگەکانیان ئەوانەیە:

1-کوردستان داگیرو دابەشکراوە بە سەر سوریا، عێراق، ئێران، تورکیا.. ناویشیان دەوڵەتی ئیسلامە، وا دەردەکەوێ کە مافی کورد لەلایەن ئیسلام خورابێ، بەتایبەتی کاتێ دەبینرێ لەو هەموو مەینەتیەی بەسەر کورد هاتووە لەو وولاتە ئیسلامیانە و جامیعەی عەرەبی و کۆنگرەی ئیسلامی و رێکخراوێکی لەو جۆرانە بە هانای کورد نەهاتوون، ئیتر دیمەن و ڕای گشتیەك بەسانایی بیرو ئەقڵی کورد دەوروژێنێ کە هەر ئیسلام چەوسێنەری کورد بووە، بەسانایی بیرۆکەیەکی هەلبەستراو ئەکتیڤ دەکات کە دەڵێن: داگیرکردنی کوردستان بەناوی (فتح)ی ئیسلام ئەنفالی یەکەم بووەو ئەنفالی بەعسیش دووەمە، ، زیاتر لەوانەش پرسیار و فەرمایشتێکی چەوتی وەك گۆتەی: (خودی فکری ئیسلامی لە خزمەت شۆڤێنی و ناسیۆنالیزمی عەرەبی دایەو بەشێکە لە فەرهەنگی داگیرکاری)، (بەهۆی ئیسلام کورد دەبێتە خزمەتکاری عەرەب)، پرسیاری تری وەك ئیسلام کورد دەکاتە بەلاگێڕی خۆی کەچی میللەتانی تر ئیسلام دەکەنە بەراگێڕی خۆیان ،هەمووی سودی لەئیسلام بینیوە تەنها کورد نەبێ...لەگەڵ زۆر گەلالەی ترکە ئیسلامیەکان بە چاکی وەلامیان پێ نەبوە .

2- لەسالی 1963لە هەلمەتی یەکەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەکان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا بەپێی مادەی(2)ی (معاهده الدفاع المشترك بين دول الجامعه العربيه)کە لە 1950/4/13 مۆرکرابوو، لەوێشەوە بۆ هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە 1963/10/8بەسترا بوو ،پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفڕۆکەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاکستانیش یارمەتی عێراقیان دا، لە ئەنفالی دووەمی 1988 لەسەرئاستی عەرەبی تەواوی جامیعەی عربی پالپشتی عێراق بوون دژ بەکورد،زیاتر لەوەش هەندی وولاتی عەرەبی دیسان هێزیان ناردبەشداری ئەنفالی کردوە(وەك لەدانپێهێنانی مدیری هەوالگری گشتی بەعس)دەڵێت: یەمەن بە لیوای(عروبە)وئوردەن بەلیوای(یەرموك)وسودان بە(متطوعين)ووولاتانی کەنداویش بە یارمەتی مادی بەشدار بووینە[1299] .

بینرا لە تەنگانەکانی کورد هەر ڕێکخراوی غەیرە ئیسلامی ولآتانی ڕۆژئاوا بە هانایان هاتنننەك جیهانی ئیسلامی ، لەو کاتی کە عەرەب و وولاتانی ئیسلامی گەلە کۆییان لە کورد کرد یەکێتی سۆڤیەت سکالآیەکی بەرزکردەوە بۆ نەتەوە یەکگرتوە(رقم E/3809 9تموز 1963 الجلسه 36 امم المتحده)تیایدا داوای کرد ئەو پەلامارە عربیەی بۆ سەر کوردستان بە جینۆساید لە قەلەم بدرێ .

دەنگی نارەزایی لەنێوجیهانی مەسیحیە زیاتر نەك لە جیهانی ئیسلامی،لەبەڵگەنامەی ئەمریکی (دۆسیەی پەیوەندی دەرەوەE41969 ـ 1972/7/5) دەڵێ‌یەکەم جارکریسمیس دانی بەئۆتۆنۆمی بۆکوردهێناوە، واتە ڕایەکی نیمچە گشتی دروست دەکا کە (ئیسلام و موسوڵمانان) دۆست و ڕزگارکەری کورد نین، بە دووبارە بوونەوەی ڕووداوەکان ودووبارە بوونەوەی هەمان ئەنجام قەیرانێکی سەخت بۆ عەوامی کورد دروست دەبێت کە ئەوە موسولمان وئیسلام سەرچاوەی مەینەتی کوردن ،کاتێ ئەو پرسیارە ڕوو لە ئیسلامی کوردی دەکا وەلامی ڕوونی نیە ،ئەوە سەرچاوەیەکی هەمیشەیی قەیرانی عەقلیەتی ئاینپەروەری کورد دروست دەکات.

3-ئاینپەروەروزاناو ئیسلامی کورد تووشی ناکۆکیەکی تری عەقلی دەبێتەوە کە (فقهی رزگاری) بۆ مافی چارەنوس زۆر لاوازە (یان هەرنیە) ،لەکاتێ دەبینین کۆمەلێك مادەو بڕیارِ هەیە لە نیودەولەتی

[1299] وفيق سامرائی- حطام بوابة الشرقية ص130 .

بۆ مافی چارەنوسی گەلان وەك: مادەی (1) و مادەی (55) ی میساقی نەتەوە یەكگرتوەكان تۆمار كراوە، هەروەها بریارەكانی: ژمارە 1514 خولی(15)لە14/دیسمبر/1960، بڕیاڕی ژ:2105 خولی (20) لە1965ز، بریاری ژ:2625 خولی 25 لە24/ئۆكتۆبەر/1970، بریاری ژ:3070 خولی28لە 1975، هەروەهابریاری 3314سالی 1974... لەهەمان ئەنجوومەن دەرچووە، ئینجا پێشووتر لە 14 خالەكەی ویلسونی ئەمریكی لە ساڵی 1918 ولێدوانە هاوبەشەكەی بریتانی - فەرەنسی لە 1918، بنەماكانی شۆرشی ئۆكتۆبەری 1917ی رووسی و شۆرشەكانی پێشوی ئەمریكی 1776 و فەرەنسا 1789 هاتووە،زیاتر لەوەش هەر 3 مادەی 62 و63 و64ی سیڤەر و مادەی 16ی ئینتداب بەسەر عێراق و..زۆری تریان هەیە.

كەچی فتواو بەلگەنامەی فقهیمان دەست ناكەوێ بەڕوونی پالپشتی مافی چارەنوسی كوردستان بێت ،بە پیچەوانەوە بەلگەنامەی پیچەوانەی ئەو مافە هەیە ، توومەت هەیە ..،ئینفسالی وباغی ویاخی وپیلانی دوژمنانی ئیسلام و..زۆری تر ، لە ڕاستیداوەڵام هەیەو فقهی رزگاری لە ئاینی ئیسلام ئاوا لاواز نیە ،گرفتەكە لەوەیە مونەزیری ئیسلامی بۆ (فقهی رزگاری) لاوازە، قەیرانی عەقلی ئاینپەروەری كورد لێرە بەرجەستە دەبێت كەناتوانی فقهێكی تایبەتی بۆ دۆزە ڕەواكەی خۆی بەرهەم بهێنیٚ بیكاتە بنچینەیەكی شەرعی بۆ ئەو دۆزەو ڕەهەندی ئاینی بداتە بزوتنەوەی رزگاری خوازی كورد.

3-قەیران وپرسیاری تر ڕووبەڕووی عەقلی ئیسلامی كورد دەبێتەوە لە ناكۆكیەكی تر،لەلایەك خۆی بە سونی دەزانی كەچی سونی عەرەب لە شیعەو مەزهەبی تر زیاتر دژ بەكوردن ، بۆیەش سەركردە كوردەكانی هاوچەرخ زیاتر هاوپەیمانیان لەگەڵ ئەوان هەبوە وەك:هاوپەیمانی شیخ محمودو ئایەتواللە شیرازی سەرۆكی شۆرشی بیست،دوای هاوپەیمانی بكرصدقی كورد وئایەتواللە كاشف **الغطا** ،دوای مەلا مستەفا لەگەڵ محسن الحكیم، تادەگاتە هاوپەیمانی ئیستای بارزانی وتالەبانی لە گەل حزب وسەركردە شیعەكان، زیاتر لەوەش محسن الحكیم لەدوای هەلمەتە ئەنفالیەكانی عبدالسلام عارف بۆ سەر كوردستان لە 1963-1964 كۆنگرەیەكی ئیسلامی رێكخست لە بەغدا زانایەكی زۆر ئامادە بوون لەوانە (شیخی ئەزهەر) بۆ ئەوەی بە فتوا كورد بە یاخی (مارق) هەژمار بكەن بە پێی ئایەتی:(إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ

تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)،لەوەوە لە 5ی تەموزی 1965 فتوا بە ناوبانگەکەی محسن الحكيم دەرچوو دژ بەو کۆنگرەو دژ بە شەڕی کورد،هەروەها (علی سیستانی)مەرجەعی شیعەی ئیستایان دووبارە لە بارەی کوردفتوای فیدرالی هەیە[1300]،یەکەم وەسیقەی(فتوایی) ئاینیە سەبارەت بە دۆزی کورد،بۆ عێراق لەدەستور بە هێز ترە،زۆر بەدەگمەن وەها هەلویستیك لە زانای سونە دەست دەکەوێ .

ئەوانە هەموی قەیران لەناوقەیران بۆ عەقلیەتی موسولمانی کورد دروست دەکا سەرباری قەیرانە ڕەسەنەکانی گشتی بۆ عەقلی هەمو موسولمانیك دروست بوە .

## دوەم - تەوەری عەلمانی ( سەرسامی –لاسایی–تەبەعی –قەیران)

لەسەروو هۆکاری قەیرانی عەقلی باس کرا فرە ئاڕستەو سەرچاوە بوو ،زیاتر لەدوای مەینەتی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم لێی بەدیاردەکەوێ لەژێر سایەی نەبوونی دەولەت ، تووشی شەرم وشکستی دەروونی دەبێ،بەتایبەتی لەکاتی تەماسی بە فەرهەنگی میلەتانی ترجۆرە تێکگیرانیکی فەرهەنگی ڕوودەدا بە خیرایی ئەوەی بیگانە زال دەبێت،کەمتر متمانەی بەخۆی دەمێنێ،ئەوە دەردی میلەتانی ژێر دەستەیە ، کاریگەری سیاسی و دەروونی و فەرهەنگی قوولّی بەجێ هێشتووە، بۆیە لای بەشیکی زۆری کۆمەڵگەی کورد(بەتایبەتی سەرسنورانی لەگەل میلەتانی تر) وادەرکەوتووە هەرچی لەدەرەوەی کورد بێت مەزن و گرنگ و پتەو بەچارەنووسە، هەرچی لای خودی کوردیش بێت بچووك و دەڤەری و لەرزۆك و بێچارەنووسە، دەبینین ئینتمای نیشتمانی و نەتەوەیی و ئاینی و فەرهەنگی لاواز بووە، بەخێرایی دەگۆڕێن، بەخێرایی جل وبەرگ و دیمەنی خۆیان دەگۆڕن، زمان و نەریتیان دەگۆڕن، نەتەوەیان گۆڕی، هەتا ئاینیش دەگۆڕن، یان ئەو بەشەی کە لەناوجەرگەی کوردستان دەردەچیێ بۆ وولاتانی دەرەوە بەخیرایی ئەو دەردانە دەگرێ .

---

[1300] دەقی فتواکەی (24ذی الحجة11424)سەبارەت بە فیدرالی کە لە وەسیقە رقم53 دەرچوە ،ئەوە دەقەکەیەتی: ((ان اصل الفدراليه ونوعهاالمناسب للعراق،.. ومن المؤكد ان ممثلى الشعب الكوردى العزيزفى مجلس كتابة الدستور سيتوصلون مع سائر اخوانهم العراقين الى صيغةمثلىتحفظ وحدةالعراق كما تحفظ الحقوق جميع اعراقة وقومياته))—النصوص الصادرة عن السيد السيستانى فى المسألة العراقية ص280

ئەودەردە پێی دەوترێ (قەیرانی فەرهەنگی)، بەهەمان پرۆسە دەپەرێتەوە بۆ قەیرانی عەقلی سیاسی،بەتایبەتی لەلایەن ئەو مونەزیرانەی لەگەل دەرەکی وبیگانە کارلیکیان هەیە، بەدەگمەن مونەزیرو سەرکردەی ڕەسەن دەدۆزیەوە دووچاری ئەو دەردە نەبێت ،ئەگەر تووش نەبوو عادەتەن بەسەرکردەی وا دەووترێ (کاریزمی)، باقیەکەی تر وادەردەکەوێ ئەوە ڕەوشەنبیرو زمان زان وشارەزایە کەچی ناتوانێ سود لە پەندو وانەی دەرەکی وا وەرگرێ کە ڕەسەنایەتیش بپارێزێ ، لە قۆناغی نوێ(دوای 1976 تا ئەو نوسینە) تەیار و مەدرەسەیەکی عەلمانی کوردی نادۆزیەوە لەسەر ڕێبازی زانا و ناودارێکی کوردستانی بێ، زۆربەیان مارکسی بوون، زۆر بیریاری مارکسی کورد هەبوو ،ڕەنگە نمونەی (مام جەلال)ڕوون بێت زیرەك و داهێنەر و بلیمەتێکە بەدەگمەن لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ولاتانی عەرەب بە ئەندازەی ئەو بیریارە شارەزا هەبێ، یان(عبداللە ئۆجەلان) مارکسیەتی واقعی و شۆڕشگێڕتریش بوو ، کەچی تەیارە عەلمانیە کوردستانیەکان بەهۆی دەردی (تقزم) دوای (مارکس وئەنجلس ولینین) ڕوویان لە(هۆشی مین، ئۆگستین نیتۆ، ترۆتسکی، ماو..،منصوری حکمەت، جۆرج تەرابیشی ..)یان دەکردە پێشەوا، چونکە کورد نەبوون .

ئەو قەیرانەی فەرهەنگی وسیاسیە بەخێرایی داهێنانی عەقلیت سست دەکا وات لێدەکا لاساییکەرەوە بێت، سەرنجێکی بەدیقەت بداتە فەرهەنگی حزبە کوردستانیەکان (عەلمانی وئاینیەوە)بە ناوو ناوەڕۆك و هەلس و کەوت و ناوی ڕۆژنامەو جۆری ئایدیۆلۆجیا و هەتا جۆری گوتاری سیاسی.. دەبینی لاسایی کردنەوەیەکی پەتی بیانیە بێ داهێنان،هەرلەقۆناغی نوێی حزبایەتی زۆربە پەڕەگریەوە بەرەو مەدرەسەرمارکسی وڕۆژهەلاتی ڕۆیشتن،دوای ئەویش شکستی هێنا، ئیستابەرەوسەرمایەداری ڕۆژئاوایین.

لەسەردەمی کاریگەری مارکسی بەسەر عەقلی کورد زۆربە هێزبوو، تەنانەت ناوو دروشم وبلاوکراوەورۆژنامەکانیشیان کت ومت لەوان وەرگرتبوو، ئەگەر هەندیکی وەرگرین(دریژەی لە چەمکی تقزم الثقافی هەیە) : لە کوردستان(حزبی سوشیالیستی یەکگرتوو) هەبوو ڕێك لاسایی حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی ئەلمانیای 1919 بە سەرۆکایەتی روزا لوکسمبورگ ،دوای حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی فرنسی 1961دروست بوە، هەر لەکوردستان(حزبی زەحمەتکیش

وكريكاران ورەنجدەران)مان هەبوو لاساى حزبى زەحمەتكيشانى ئەلبانى،كۆمەلەى رەنجدەرانى كوردستان لاساى كۆمەلەى ڕەنجدەرانى لاوسە ، پاسۆكمان هەبو ناوەكەى لەحزبى سۆشياليستو پاسۆك لە يۆنان وەرگيراوە، پارتى كارى سەربەخۆى كوردستان هەبوو ئەوەتا ناوو ناوەڕۆكى لە پارتى كارى سەربەخۆى كۆرياوەرگيراوە بە سەرۆكايەتى كيم ئيل سونگ، لە كوردستان ڕەوتى كۆمەنيست هەبوو ئەوەش لە ڕەوتى كۆمەنيستى ئيتالياوەرگيراوە،پارتى گەل ودواى پارتى گەلى ديموكراسيمان هەبوو ئەوە لە پارتى گەلى ئەفغانستان وەرگيراوە كە لە 1946 دامەزراوەلە سالى 1920 (حزب الشعب السورى)يش هەبوە، پارتى گەلى توركياش هەبوولە سالى 1962 دروست بوو ،پارتى كريكارانى كوردستان(پ ك ك) لە جيهانى شيوعى زۆر بلاوە پارتى كريكارانى بلجيكى لە 1885 دروست بوە،پارتى كريكارانى مەجەرى لە1918 دروست بوە، پارتى كريكارانى ڤيتنامى پارتى كريكارانى ئەلبانى ، ناوى (يەكێتى نيشتمانى كوردستان) و پێكهاتەو ئەو تيۆرەى لەسەرى دەڕۆيشت و وا لەسەرى دەڕوا، وەك ئەزموونێكى نوێيە لە كوردستان، كەچى دەبينين ئەوەش كت و مت لاسايى كردنەوەى ناوو ناوەڕۆك و ئەزموونى هەندێ حزبى جيهانە، لەوانە:( ئەزمون وناوى (يەكيتى نيشتمانى سودانى(سانو).ئەزموونى( يەكێتى نيشتمانى ئەنگۆلى) ، ئەزموونى يەكێتى نيشتمانى زيمبابۆى(زانۆ)، زياتر ويچووى ئەزموونى يەكێتى نيشتمانى كينى لە ساڵى 1960 دروست بوو لە 3 باڵ (بزوتنەوەى سەربەخۆى كينيا، كۆمەڵەى هەڵبژاردە، هێڵى گشتى ئەفريقيا) ئەوە كت ومت و ناو و ناوەڕۆكى (ى ن ك) كە پێكهاتبوو لە سێ باڵ (بزوتنەوە، كۆمەڵە، خەتى گشتى).

لە قۆناغى پيشوتريش سەرچاوەى هەموحزبەكوردستانيەكانى(عەلمانى) بۆ (پ د ك)دەگەڕێتەوە،ئەويش بۆ (هيوا)،هيواش بۆ(حزبى داركەر) بەسەرۆكايەتى رفيق حلمى، ئەويش ڕێك كۆپى (كاربۆنارى ئيتاليايە)[1301] .

ئەودەردە تايبەت نيە بە چين وتوێژو لايەنەكانى خوارەوە زياتر سەرووى گرتۆتەوە ،مام جلال كە گەورەترين مونەزيرى ئەو سەردەمەيە لە بەراوردى نيوان ئيسلام وسۆشياليستى ڕاى وايە كە سۆشياليست بەهەشتى پێيە بۆ ئەو دنيايە ، هەرچى ئيسلامە دەلێ خۆ ڕاگرن بەهەشتان لە دواڕۆژ

---

[1301] دريژەتر بڕوانە: ناسنامەى حزبە كوردستانيەكان .

پیٚ دەدەم[1302]،ئەوە دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەلیٚ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل في أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلي الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية في هذا العالم الدنيوي)[1303]،هەمان بەراورد موفەكیری گەورەی كورد عبدالله ئۆجەلان دەیكا دەلیٚ: پیغمبەرو ئیمام علی لە ئیمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی (د جورج حنا) یە كەدەلیٚ  پیغمبەرەكان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە كایەوە[1304] هەردوولاشیان لە مانیفیستەكەی (ماركس وئەنجلس)بۆجاڕدانی شیوعی ووتویانە: سەركەوتنی ئاینی مەسیحی لەكاتی خۆی سەركەوتن بوو بۆ میٚژووش[1305].

## تێكڕای قەیرانی عەقلی كوردی ڕاستەقینە

لێرەدا كۆمەلێك چەمك هەیە دەبیٚ لیكجیا بكرێتەوە ،سود وەرگرتنی لە ئەزمونی بەشەری نەك ئاساییە بەلكو پیویستەو شارستانیەكان بەو شێوەیە كارلێك دەكەن ،بەلام لاسایی كردنەوە پلەیەكی تری نزمی ئەو كارلێكەیە،پلەی هەرە نزمی لاسایی تەواوی ئەزمونیكی تر بكەیەوە ،لەدوای ئەوە قۆناغیكی تر دێت لە لاسایی كردنەوە دەردەچێت دەبێتە قەیرانی عەقلی ،ئەویش ئەگەر لەلاسایی كردنەوەدا لایەنی سەلبی و ئیجابی بێلیكجیاكردنەوە هەلبژێری ، خراپ ترین قەیرانی عەقلیش ئەوەیە ئەگەر تەنها لایەنی سەلبیەكەت هەلبژارد .

فەلسەفەی لاسایی و پەیوەندی  بە عەقلی دواكەوتەیی لەوە دێت كە (لاسایی) مانای فاكتەری دەرەكی دەدات بۆ پرۆسەی گەشەی عەقل ،تا عەقل بە فاكتەری ناوەكی زیاتر گەشە بكا ئەوە نیشانەی بالایی عەقلە ،بە پیچەوانەش تا عەقل زیاتر لە ژێر كاریگەری فاكتەری دەرەكی بیت ئەو عەقلە دواكەوتە تر دەبیت ،هەرلەمنداليەوە تا پیگەیشتن ئەو ریسایە ڕاست ودروستە ،بۆیە ئەو قۆناغانەی لاسایی گوزارشیكی ڕاستەوخۆی قەیرانی عەقلیە .

---

[1302]بڕوانە :دەقی ووتارەكەی مام جلال بە بۆنەی یەكگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك) .

[1303]مایكل لوڤ – الماركسيه والدين  ترجمه : بشير السباعى ص3

[1304]د جورج حنا– قصه الأنسان ص65

[1305]ماركس– انجلس   بيان الشيوعى ص64.

زۆربەی رەوشەنبیرو نوسەرو حزبە کوردستانیەکان زیاتر لایەنە نێگەتیڤەکانیان هاوردووە نەك پۆزەتیڤ، لە ئەزموونی بزوتنەوەی شیوعیەت، ئۆرۆشیوعی چاکتر بوو لە ستالینیە شیوعیەکان، کەچی مارکسیەکانی کوردستان ستالینیانە بوون، سەرسام بەلایەنی سەلبی ، بە هەمان شێوەی توندی وا ئێستاش ڕوویان لە لیبرالی وبەها رۆژئاواییەکان کردوە دوای ئەوەی 30 ساڵ زۆر بەخەستی لەدژی بوون دیسان لای سەلبیەکانیان وەرگرتووە، خۆ ئەو عەلمانیەتەی رۆژئاوا یەك شت نیە، هەر ئەو عەلمانیەتە سیستەمی ئیمپریالیزم وهەردوو جەنگی جیهانی و تۆرانی ونازی وفاشی و شۆڤینی وبەعسیەتی هێناوەتە بەرهەم ..( ئەو عەلمانیەی ئیستا لە کوردستان پەیڕەو دەکری ئەندازیارەکەی (مۆسۆلینی سەرۆکی بزوتنەوەی فاشیە ) لە سالی 1929 جاڕی دا کە ریکەوتنی لەگەل پاپا کردووە بۆ دابەشی دەسەلاتی ئاینی ودونیایی بەو شیوەیە .:مرۆڤ لەبوونیەوە تامردن بۆ مۆسۆلینی بیت لە دوای مردنیش بۆ پاپا بیت هەتا قیامەت!!) ، سەرەرای دەردی لیبرالیەتی کۆمەڵایەتی، بازاڕی ئازاد، چینایەتی و ڕەگەزپەرستی، دووره ئاینی و ئەخلاقی ..وەك لایەنی سەلبیەکەی، لایەنی ئیجابیەکەی ڕۆژئاواش بریتیە لە دیموکراسی وپرۆسەی سیاسی، مەدەنیەتی، دەستگۆڕی دەسەڵاتی، تەکنەلۆجیاکەی، ئازادی ڕادەربڕینی، سەروەری یاسا، خۆشەویستی ووڵات.. ، یەخەگیری باقی سەلبیاتەکانی تر بووە هێناویەتی بەسەر کوردی دا پەیڕەو دەکا،وازی لە عەلمانیەتی فرنسی وبریتانی وئەمریکی و..هێناوە یەخەگیری عەلمانیەتەکەی ئیتالیا بوە .

هەڵبەتە ئەو دۆخە لەنێو ڕۆژهەڵات و هەمو جیهانی ئیسلامی نیە، ئەو دەردە زیاتر لەنێو دەسەڵاتدارانی عەرەب هەیە، دەسەڵاتدارانی کوردیشی گرتۆتەوە.

لایەکی تری قەیرانی عەقلی ڕاستەقینە لە کوڕایی سەلبی دەردەکەوێ ، ئەگەر قەیرانی عەقلی هەبوو هەر پەرتەوازەیی وناکۆکی نابێتە دەرد بەلکو کوڕایی وتەباییش دەردو قەیرانە، واباوە یەکڕایی(ئیجماع) جێگەی دڵنیایی و نیشانەی وشیاری و پێکانی بابەتەکەیە، زانایان پێیان وایە هەمو یەك دەنگیەکیان ڕەواو دروست نیە،بەشیکی تر بە ڕەها تر بۆ ئەو باتە چووینە : لەوانە (هۆبز)، (نیتچە)، (دۆرکایم) لە هەموان زیاتر (میکاڤیلی) بە سەلبی دەڕوانێتە (یەکڕایی) ،تەنانەت

له پرۆتۆکۆلی (ژ:1)ی (بروتوكولات حكماو صهيون) دەلێت:( ان الجمهور بربري، وتصرفاته في كل مناسبة على هذا النحو، فما أن يضمن الرعاع الحرية، حتى يمسخوها سريعاً فوضى، والفوضى في ذاتها قمة البربرية) ،ئەوانە پێیان وایە هەردەم بەهەڵەدا دەچێ، (دورکایم)یش پێی وایە مرۆڤ (جەنەی ڕەوەیی) هەیە،پێیوایەکەسیکی سەرەکی ڕەوە کارێکی کرد ئەوانی تر (ناماقولانە) لاسایی دەکەنەوە، ئیتر سەرەنجامی کارەکە چەوت دەردەچێ، ئەوەی تێبینی کردبوو لە جموجوڵی شۆڕشی فەڕەنسی کە چۆن ناماقوڵانە پردیان دەشکاند، دام و دەزگایان تێك دەدا، (میکاڤیلی)ش لە وەسفی (عەوام) دەڵێ: هەردەم هەڵخەڵەتاون، مێشکی ئەرشیفیان نیە تەنها دوا وێنەی ڕووداوەکانیان پێ دەخوێنرێتەوە.. ،هەڵبەتە ئەو بۆچوونە ڕەهایانە هەموی ڕاست نیە لەهەمان کات ڕاستیەکیشی تیایە ،یەکڕایی هەیە ڕاستی دەپێکێ و هەشە بە پێچەوانە، لە فکری ئاینی ساغ یەك ڕایی (ئومەت) هەرگیز چەوتی هەڵناگرێ، ئیمامی عەلی زۆر بە وردتر سنوری بۆ کێشاوە، پێی وایە لەکاتێکدا (باوەڕدار) خەڵکێکی ڕەوشەنبیر و دڵسۆزە ئەگەر یەك ڕایی بوون ئەوا نیشانەی دروستیەتی، بەڵام یەکڕایی عەوام(یان ئەوانەی قەیرانی عەقلیان هەیە) جێگەی مەترسی بووەو دەڵێ: (العوام، ينحنون بكل ريح، إذا تجمعوا ذروا، وإذا انتشروا نفعوا..)، کەواتە یەکڕایی مەرجی خۆی هەیە بۆ سەرکەوتن و پێکان و ڕاستی و دروستی.

ئەو تیۆرەی سەروو بەسەر ڕەوشەنبیری کور دپیادەبکەین لایەنیکی تری پیکهێنەری قەیرانی عەقلی کورد دەردەخا ، یەکڕاییەکانی ڕەوشەنبیری عەلمانی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم تاکو ئەم ساتە، کە لەسەر بابەتێکی ستراتیژی گرنگ (کۆ) دەبێ، زۆربەی جار هەڵە دەردەچێ، د.ئیسحاق سکوتلی، د.عبدالله جودت، حسن خيري، جەنەڕال شریف سعید پاسا، رفیق حلمی... زۆری تریش وەك نەوەی یەکەمی عەلمانی کورد،کۆدەنگ بوون، بەڵێنیان بە خەڵکی کوردستان دا ئەگەر بەرەو عەلمانیەتی (ئیتحاد والترقی) بێن ئەوا دوو دەستکەوتی مەزن بەدەست دەهێنن، یەکەمیان دەوڵەتێکی کوردستانی مەزن دروست دەکەن، دووەم دەبنە وڵاتێکی مەدەنی پێشکەوتووی زانستی و

تەكنۆلۆجی.. كەچی هیچیان نەهاتەدی و ئەوی هەشبوو لەدەست چوو، لەگەڵ ئەوەش زۆربەی نەتەوەگەریە دڵسۆزەكانی كورد بەو بانگەوازانە هەڵخەڵەتان و لایەنگیری تەیاری عەلمانی نەتەوەگەری توركیان گرت لە ناكۆكی نێوان كەمالی و خەلافەتدا لە فەترەی 1908-1924 ،هەروەك (تۆماس بوا) لە كتێبی (تاریخ الاكراد) دەڵێ: ئەگەر عەلمانیەتی كورد پشتگیری كەمالیەكانی نەكردبایە هەرگیز ئەنقەرەی كەمالی بەسەر ئەستەمبولی خەلافەت زاڵ نەدەبوو، لە كۆتایدا كۆماری توركیا بەخۆ بەو دەستورە عەلمانیە نەتەوەییە دروست بوو، ئنجا دەركەوت ئەو یەكڕاییەی چەندە قەیران بوە جیاواز بوونایە باشتر بوو، ئەو بەڵێنانەی ڕەوشەنبیرانی كورد ئاوا لە پرسی (مەشروتیەت) ئنجا (بزوتنەوەی 1908ی ئیتحادیەكان، ئینتداب، سەربەخۆیی دەوڵەتان، گۆڕانی پادشایی بۆكۆماری 1958،تا ئینقلابی 1963وئینقلابی دوەمی 1968.. هتد). لە هەمووی بە هەڵەدا چووینە تا ئەم ساتەش.

لەدوای ئەو ئەزموونە تاڵانە دیسان ڕەوشەنبیرانی كورد بەتێكڕایی ڕوویان لە چەپی كردو ئیتر هۆنراوە و نوسین و ناو ئەدەبیاتی شۆڕشگێڕی كورد هەمووی بووە ماركسیەت و ئەو ساتی ئەو زاراوانە باویان هەبوو (پرۆلیتاری شۆڕشگێڕی، سرودی ئینتەرناشیۆنال، بەڵێنی سۆڤیەت، سەربازگەی سۆشیالیستی، كۆمۆنیستیەت، دیكتاتۆری پرۆلیتاری، موڵكیەی گشتی، سۆشیالیستی زانستی، حتمیە التأریخیە...)، ئەو زاراوە و فەرمایشتانەش بەو فەرهەنگی ئەو ئەودەمی نێگەتیڤ بوون، لەوانە: (ڕەجعیەت، دەرەبەگ، یاسا، دیموكراسی، كۆمەڵگەی مەدەنی، مافی نەتەوەیی، بورجوازی، ئیمپریالیزم، ئەمریكا، لیبرالیزم، موڵكیەتی تایبەتی، سەرمایەداری، بازاڕی ئازاد..)، ئەگەر لێی وردبیەوە بە پێچەوانەی ئێستایە.

ئەگەر كۆڕاییەكە چەوت وزیان بەخش بوو ،بەهەمان شێوە ناكۆكیەكانیشیان زیان بەخش بوو ،كۆمەڵێك جەنگی ناوەخۆ و لێك داتلیشان و ململانێ لەسەر ئەو تیۆرە سیاسیانە پەیدا بوو.. گەلی دەرفەتی جیهانی دەگمەنمان بەهۆیەوە لەدەست چوو.

ئەوکاتی مارکسی نەبوون توومەت بوو بە لایەنگری رۆژئاوای مشەخۆی سەرمایەدارین، بەو ئەندازەیە ئێستا دیسان لە شێوە عەلمانیەکیان گرتۆتە بەر لە (ملکی اکپر من ملك) رۆژئاوا خراتر، دیسان گۆڕاو (ئیجماعن) لەسەر ئەزموونی رۆژئاوایی و بەرەهایی وەری دەگرن.

کێشە و قەیرانی عەقلی ئەو ڕەوشەنبیرانە ئەوەیە بەپێی بازاڕی جیهانی هەڵوێست و بیروبۆچوون دەگۆڕن، خۆیان بەرهەمی بڕوا و ئایدیۆلۆجیای خۆیان نیە، ئیتر هۆکاری دەرەکی پەتی بوو وای کرد ڕەوشەنبیر و سیاسەتمەداری کورد واز لەو مارکسیەتە پیرۆزەیان بهێنێ، ئێستاش هەمان دۆخە..کاتێ بەتەرازووی زانایانی (بەتایبەتی دورکایم) هەلیدەسەنگێنی ، لەلای ئایینیش (ئیمامی عەلی) وەسفی —عەوام- بەووردی دەردەکەوێ قەیرانی عەقلی هەیە، هەڵبەتە دیسان ئەو یەك ڕاییەی رۆشنبیری کورد بە کۆمەڵێك زەرو زیان دەچێتە نێو سەدەی (21) بە شکستی.

<u>زیانەکانی :</u>

مادام ( عەقلی عەلمانی) کوردی و (عەقلی ئیسلامی) قەیرانی هەبێ ئەوا دەتوانین بلێین عەقلی کوردی لە قەیراندایە ، بۆیە سەرەتای گەشەو رزگاری لە رزگاری ئەو قەیرانانە دەست پێدەکا، ئیتر کۆمەڵێك سەرەنجامی نێگەتیڤی ترسناکی لەگەڵ خۆ گواستەوە، بووە هۆی لەنگی لە هەڵسەنگاندن و قەبلاندن و بۆچوون و پێشبینی و چارەسەریەکان، بۆیە دەبینین ڕەوشەنبیری کورد لە هەڵوێست و هەڵسەنگاندن و پێشبینی و چارەسەریدا نەك هەر ناپیێکێ زۆربەی جار پێچەوانەی واقیعە، بۆیە نابنە بەشێك لە چاکسازی لە(قەیرانی عەقلیەتی کوردی)،بەلکو تائەو ساتە بەشیکن لە دروست کردنی زیانەکانی ئەو دەردە کە بریتیە لە :(رابووردوو پەرستی- بیگانە پەرستی-خۆبەبچوك زانی — شەرم لەخۆو میژووی خۆ-دواکەوتن - لاسایی کردنەوەی بێداهێنان-لاوازی ئیرادەو بنەمای فیکری-لاوازی لە ئنتما — تێڕوانینی نەرینی بۆ فەرهەنگ وکەلتورەو میژوو -..)ڕەنگە هەندیکی هەست پێنەکەن ئەو ڕۆلە دەبینی ، ئەوانە گشتیەکانن ئینجا زیانی تری ناتوانن (یەکێتی نیشتمانی )بۆ وولات دروست بکەن نە دەشتوانین (گەشە) بکەن، ئەوە مانای ئەوە نیە ئەو دەردە هەموو

ڕەوشەنبیرانی گرتبێتەوە،بڵێین چارەسەریەکەی بە عەقلی کوردی ناکرێت ،نەخێر ئەوەی باسمان کرد بەشی زۆریە نەك هەمو،بۆیە چاکسازی لە عەقلیەتی کوردی بە عەقلی کوردی خۆشیەوە دەکرێت .

نمونەیەکی پراکتیکی : نمونەیەك هەلدەبژێرین بۆ هەردوو تەوەری (ئاینی وعەلمانی)کە چۆن هەریەکەیان بە جۆرێك لێی بەهەلەدادەچن لە ئەنجامی قەیرانی عەقلی ، ئەویش بەراوردیکی هەردوو دۆزی ڕەوای فلستین وکوردە ،کەچی هەلویستەکانی کورد چەندە ناتەبایە ، ئەو ئاین پەروەرانەی کورد کە کەوتۆنە ژێر کاریگەری عەقلی عەرەبی ، ناتوانێ عەقلی عربی وعەقلی ئاینی لێك جیاکاتەوە ،ڕەهەندی نەتەوەی وئاینی لەو دۆزە لێتێکەل کراوەو بە دۆزیکی ئاینی بۆ گوزارش کراوەپێی وایە دۆزی فلستین پیرۆزەودۆزی کوردیش دروستکراوی دوژمنانی ئیسلامە، یان هەرە چاکەکەیان پێی وایە دۆزی فلستین لەدۆزی کوردپیرۆزترە ،هەرچی عەلمانیشە لە ئەنجامی (حوکم لەسەر میژوو بەپێی واقیع)تووشی هەلویستیکی پیچەوانە بوە ،جاروایە دەگاتە ئەو هەلویستە ئیسرائیلی پێ هەق ترە لە فلستینیەکان ،بۆیە بەراوردیکی هەردوو دۆزی(کوردو فلستین) بەخیرایی پیویستە:

1-هاوبەشی لە پەیدا بوونی هەردوودۆز (مەینەتی هەردوولا لەیەك کارخانە دروست بووە، لەکۆنگرەی سایکس پیکۆ بێ بەش کران، ، داگیرکەری هەردوولا بەیەك (بەشی 7ی سیڤەر)دروست بون، عیراقی داگیرکەری کوردستان بە پێی مادەی 94 دروست بوو ئیسرائیلی داگیرکەری فلستینیش بە مادەی 95، کوردستان بە پێی بڕیارەکانی سایکس پیکۆو سان ریمۆو لۆزان بۆ چوار بەشی سەرەکی دابەشکرا فلستینیش بە هەمان بڕیارو لەکۆتاییەکەی بە بڕیاری 181 بۆ چوار پارچە دابەشکرا، هەردوولا بە پێی (مادەی 22ی بەشی یەکەمی عەهدی عوسبەتولئومەم)کەوتنە ژێر سیستەمی ئینتدابی دەوڵەتە داگیرکەرەکەو لەوێش بۆ ژێر ئینتدابی بەریتانی ، هەردوولا دووچاری چەوساندنەوە وپاکتاوی ڕەگەزی بوینە، لە فلستین (مستەوتنی یەهودی) لەکوردستانیش(مستەوتنی تەعریب) .

2-هەندێ جیاوازی ( کوردستان هەر دەسەلاتی کوردی تیا بوە لە فەڵستین دەسەلاتی تایبەتی عەرەبی تیا نەبوە، لەسەردەمی عوسمانی قودس سنجاق بوو کەچی کوردستان لەسەرووی ویلایەت ولە

ئاستی ئیالەت بوو، ناوی کوردستان گوزارش لە پەیوەندیەکی مێژوویی وجوگرافی وکۆمەلآیەتی و سیاسی ویاسایی خاکی کوردان دەکا، بەلآم فلستین ناوێکە گوزارش لەو پەیوەندیە لەگەل عەرەب ناکا، لە بنەچەشدا ناوەکە یۆنانیە ، شان بەشانی عەرەب گەلی یەهودیشی لێبوە ناویان (سابرا) بوە، لە کوردستان عەرەبی لێنەبوەبەکۆمەل، ئەوان ئێستا ولآتانی عەرەبیان لە پشتە بەلآم کورد بێ پشتیوانە، دەولەتی داگیرکەری فلستین لە چاو داگیرکەری کوردستان بە ویژدان ترو دیموکراسی ترە)

ئەوە بەکورتی بەراوردەکەیە ،کەواتە ئەو ئاین پەروەرانەی دۆزی فستینیان پێ پیرۆزترو مەرکەزی ترە چەندە بەهەلەداچووینەو گوزارشیکی ڕوونی قەیرانی عەقلیە ،لەهەمان کاتدا ئەو عەلمانیانەی پێیان وابێ ئەوە بوونی ئیسرائیل پالپشتە بۆ کورد بەو ئەندازەی عەقلی ئیسلامی قەیرانی هەیە لەو پرسە، وەك دیارە بوونی ئیسرائیل لەسەر ئەو دیزاینە سیاسیەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست بوە کە تیایدا کوردستان وابەش کراوە ، بۆیەش لە پرۆژەکانی ئیسرائیل و نزیکەکانیشی (لەبارەی چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەڕاست) چارەنوسیکی سیاسی کوردی تیا نیە ، کەچی ئاینی وعەلمانی لە خۆڕا لە هەلویستیان لەو پرسە بە پیچەوانە دابەش بووینە کە نمونەی گوزارشی قەیرانی عەقلی وزیانەکانیەتی . بەو شێوەیە دەتوانین چەندین نمونەی تر وەرگرین کە گوزارش لەو زیانانە دەکات ،لە کاتیکا ئاین بۆ هەموان وەك یەکە کورد قایل بوە کە عەرەب لای خودا نزیك ترەو خاوەنی ئیسلامە ، بۆیە زانای کورد لەو سەردەمە بویری نەکردوە فقهی ئاینی پەرە پیبدات وچاکسازی بکات ،ئەوان بویری دەکەن فەرمودە بە تەواو ناتەواو هەژماربکەن ،ئایەت نسخ بکەن ..زانای کورد ناوزیری نزیك راوبۆچونی فەقیهیکیش بکەوی ئەگەر رایەکەشی چەوت بیت ، بووینە پاشکۆو لاساییکەرەوەی عەقلی عربی ، لە چۆنیەتی دارشتنی راوبۆچون وچۆنیەتی خویندنەوەی گوتارو قورئان و.زهتد.

<u>**چارەسەری قەیرانی عەقلیەتی کورد**</u>

مادام ئەو قەیرانە لە دوو سەرچاوەی سەرەکی جیادێت ،دەبێ بە جیاش چارەسەری بۆ دیاری بکرێت ،ئەوەی یەکەم کە عەلمانیە چارەسەریەکانی قورسە ،عەقلی عەلمانی کورد لە قەیرانی پاشکۆیی لایەنی سەلبی عەقلیەتی ئەزمونی بیانیە ،چونکە سەرچاوەی زانیاری ومەرجەعیەتی دەرەوەیە بیئەوەی دانیش پێبهێنی ،کێشەکانی هەر لەگەل ئاینی کوردنیە بەلکو وەرچەرخاوە بۆ دژایەتی میژووی کوردو

ناوچەکەو کەلتورو فەرهەنگ ونەریت و پێی وایە گۆڕینی ئەوانە چارەو چاکسازیە ،بەمەرجەعیەتیکی دەرەکیش،کەواتە چارەی قوڕسەو ئالۆزەو هەندێ ڕەگی دەچێتەوە سەر عەولەمەو ڕەهەندە دەولی و ژیاریەکان ،لەو دەمە ئاسۆیەکی ڕوون دەرنەکەوتوە بۆ چارەسەری بەلام ئەستەمیش نیە ، ئەوەی دوەم ئەگەری چارەسەری ئاسان ترەو کەم تریش باس کراوە ، ئەوەی دڵخۆشکەرە خەریکە بە ڕوونی هەست بکرێ کە ئەو قەیرانە (ئیستزادە) ولە ناخی ئیسلامی کورد ولە ناخی ئاینیش هەلنەقولاوە ،بۆیە ئومیدی چاکسازی وپەڕینەوە لەو قەیرانە مەحال نیە،ئەوەش دووبەشە ،بەشیکی گشتیە (لە قەیرانی عەقلی موسولمان)باس کرا ،بەشەکەی تر تایبەتە بە کوردو هەر هەموی لەوە کۆبوویتەوە کە لە ژێر کاریگەری عەقلی (تەوەری عروبی)یە، هەر میلەتێك بەو عەقلە کاریگەر بێت ئەویش لە قەیران ودواکوتنندایە،وەك لە سەروو باس کرا عەقلی عربی خۆی لە گەورەترین قەیراندایە ، بەشی هەرە زۆری ئیسلامی کورد کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جۆرە عەقلە پڕلە قەیرانەی ، بەو ڕوانگە سەقەتە ئیسلامی کورد سەیری جیهان دەکا،چاوەڕێ دەکا عەقلی عربی وێنەی دونیای بۆ بکێشی،دەریش کەوتوە ئەو وینانەی عەقلی عربی دروستی دەکا زۆر لەنگ وسەقەتە وجاریش وایە ئاوەژوە ،وێنەی ڕاستەقینەی جیهان نیە ،لەوەوە ئیسلامی کورد تووشی کاردانەوەی تایفی وتوندی ودەمارگیری ودابڕان وبێ ئینتمابی بوە ،جاریش وایە دەگاتە ئەو ڕادەیەی تەرازوو وپیوەرەکان لێ پیچەوانە دەکەنەوە دۆستی لێدەکەنە دوژمن ،سپی لێ ڕەش دەکەن ،..بە پیچەوانەشەوە ، بەتایبەتی لەدوای داگیرکردنی کوردستانەوە لەسەرەتای سەدەی بیستەم ،ئەو کاریگەریانە خەست ترو کاریگەر تر بوو ، ئیستا عەقلی عەرەبی دواکەوتو ترین عەقلە لە جیهان ،کەچی ئاین پەروەرانی کورد موعجیبە بەو عەقلە قەیراناویەو دەیەوێ خۆی ونەوەی نوێ لە ژێر سایەی ئەو عەقلە پەروەردە بکا ،توشی دابڕان دەبێ و دەنگی زیاد ناکا لە نێوەخۆ پەرتەوازە دەبن سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەیان لەنگ دەبێ .

لێرەدا چەند گەلالەیەکی چارەوچاکسازی خۆی قووت دەکاتەوە هەرە مرۆڤایەتیەکە ئەوەیە ئێمە چارەیەك ببینینەوە یارمەتیدەری قەیرانی عەقلی عربیش بێت ،چونکە چارەی قەیرانی عەقلی عربی ئۆتۆماتیکی کۆمەلیك قەیران بۆ کوردچارە دەکا ،سەرەڕای ئەوەش ئەوان میلەتیکی برای خۆمانن هەر ئازارو قەیرانێکیان ئازارە بۆ ئێمەش ، چارەی تەواوی قەیرانی عەقلی موسولمانی کوردو عەرەب چارەی کیشەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشە بە کیشەی کوردیشەوە ،بۆیە زۆر قازانجە بۆ کورد

پرۆژەیەکی هاوبەش بۆ چاکسازیەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست گەلالە بکەن کە خۆی لە خۆیدا چارەی هەردوو قەیرانی عەقلی عربی وکوردیشە ،لەگەل رەچاوی هەندێ تایبەتمەندی دۆخی عەقلی و دۆخی کۆمەلایەتی وسایکۆلۆجی کوردوعەرەب بەجیا،وەك نمونە دۆخی عەقلی عەشایەری کوردو عەرەب لەوە لیکجیایە کەکوردعەشیرەتەکەی لەسەر بنچینەی زێدو نیشتمانە(بەزۆری) کەچی عەشیرەتی عرب لەسەر بنچینەی خوینە،هەریەکە چارەیەکی تایبەتی دەخوازێ بۆ بەمەدەنی کردنیان، هەمو ئەوانە ئەگەر قورس بوو کار لەسەر قەیرانی عەقلی کوردی بە تەنها بکریت ئەویش سەرەتاکەی مسۆگەر کردنی مافی چارەنوسە .

(42)

**بەیانی فیدرالی** اعلان الفدراليه Declaration of a federal

ئەو زاراوانەش دەگرێتەوە : (پەرلەمانی کوردستان ،فیفتی بەفیفتی، فیدرالی وشەرع ، سیستەمی لامرکزی ،دروشمی دیموکراسی بۆ عیراق وئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) ، تقسيم المقسم وتجزئة المجزأة...)

بەو بەیانە دەووترێ کەلە 1992/10/4 لە پەرلەمانی کوردستان دەرچوو بە تێکڕای دەنگ لە لایەن فراکسیۆنەکانی (ی ن ک) و(پ د ك) و تورکمانی ومسیحی، تیایدا بە خواستی خۆی لە چوارچێوەی مافی چارەنوس پەیوەندی یاسایی وسیاسی هەرێمی کوردستان بە دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتی عێراقەوە دیاری کرد، ئەوەش بە یەکێ لە مەزنترین پانتایی هاوبەش هەژماردەکرێت بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی هاوچەرخ، دەروازەیەکشە بۆگەیشتن بە مافی چارەنووس کە یاسای نێودەوڵەتی دانی پیاهێناوە ، بوەتە دیکۆمێنتێکی نێودەوڵەتی و لە زۆربەی مەڵبەندە زانستی و سیاسی و یاساییەکانی ناوەکی وجیهانی پالپشتی دەکرێتە سەر، هەروەهاش دەبێتە مادەیەکی مێژویی گرنگ بۆ نەوەکانی داهاتوو.

لە پیش هەلبژاردن مشت ومڕێکی هەلبژاردنی سەخت لە نێوان (ی ن ك) و(پ د ك) ڕوویدا سەبارەت بە فیدرالی ،بە جۆرێك (ی ن ك) پشتگیری بوو کەچی (پ د ك) تەنها ئۆتۆنۆمی پێباش بوو ، دروشمە بەناوبانگەکەی (پ د ك) ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان ودیموکراسی بۆ عیراق بوو لەکۆنگرەی (9)ی سالی1979 لە خالی (5)ی بەلاغی کۆتایی دووبارە دەکرێتەوە ، هەروەها لە خالی (2)کۆنگرەی دەیەمین لە بەشی (بەرنامەی ئایندەمان) دیسان (دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان)دووپات کراوە،تا لەکۆنگرەی (11)ی سالی 1993 بە بڕیاڕی ژ:3ی ئەو کۆنگرەیە فیدرالی کرا ئامانج ،بۆیە ئەو بەیانەی فیدرالی زیاتر گوزارش لە ڕای (ی ن ك) دەکات ،بەلام هیچ لایەکیش لاریان نەبوو ،بۆ ئەوەی ووردتر لە توخمە پێکهێنەرەکانی ئەو بەیانە بگەین پێویستیەکمان بە دیاری کردنی دێزاینی پێکهاتنی پەرلەمانی ئەوسا بکەین :

پەرلەمانی کوردستان: لە دوای سالی 1974 حکومەتی عیراق قایل بوو بۆ کوردستان (ئەنجومەنی یاسادانان – مجلس تشریعی) هەبێت ،دوای بە یاسای ژ:56ی سالی 1980 ریکی خستەوە ،مانای پەرلەمانی دەبەخشی بەلام عیراق نەیویست ئاوا ناوزەد بکرێت، لە دوای راپەڕینی سالّی 1991 و کشانەوەی ئیدارەی حکومەتی ناوەندی و گەشەی رێکخستنی کۆمەڵی کوردستان و بیّ سەر و بەری بەرەی کوردستانی ومل ملانیّ ی دوو هێزە سەرەکیەکە..، هەموو ئەوانە بیری هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی یاسادانان کرایەوە لە جیاتی ئەوەی بەغدا بۆ کوردی دیاری کردبوو ،دوای شارەزایی زیاتری سەرکردایەتی کورد لەو رەهەندە یاساییانە وای کرد ناوی ئەنجومەنی یاسادانان بگۆڕێت بۆ پەرلەمان (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی) و ئەنجومەنی جیبەجێکردنیش بۆ حکومەت ،بەو شێوەیە بیرۆکەی پەرلەمان هاتە کایەوە لە 1992 ،لە هەلبژاردنێك بە پێشبڕکیّ و بەشداری ئەو حزب و لایەنانە بە ئەنجامەکانیشیەوە:

1-( لیستی زەرد) پ.د.ك: 337879 کە دەکاتە 45.2٪. یەکەم دەنگی هێنا .

سەرۆك:مسعودبارزانی 466819 کە دەکاتە 48.3٪.

2-( لیستی سەوز) ی.ن.ك +(زەحمەتکێشان): 423933 کە دەکاتە 43.8٪. د

سەرۆك: جلال تالەبانی 441057 کە دەکاتە 45.6٪.

3-لیستی (سەوز و سپی) ئیسلامی، (یەکگرتوو+بزوتنەوە): 49108 کە دەکاتە 5.08٪.

سەرۆك: عوسمان عبدالعزیز 38815 کە دەکا 04٪.

4-حسك(شین): 24882 کە دەکا 2.5٪.

سەرۆك: د محمود عوسمان23342 کە دەکا 2.4٪.

5-ح.شیوعی عێراقی: لیست:21123 کە دەکا 2.1٪.

6-پارتی گەل: 9903.

7-بێ لایەن: 501 دەنگ.

لیستی زەرد یەکەم دەنگی هێنا بە زیادی (14042) دەنگ کە دەکاتە رێژەی 1.4٪ لە سەرۆکایەتیش (25672) دەنگی زیادی هێنا،(ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی قایل نەبوو، لەو کاتی (پ.د.ك) تەنازولی لەو برە زیادە دەنگەی کرد، رێکەوتن کە ئەنجامەکەی جارِ نەدرێت، دەسەلات بۆ هەریەکەیان (50به50)، بناغەی دەسەلاتی کوردو ئەزمونی پەنجا بەپەنجا لیرەوە دێت،، یەکەم کۆبونەوەیان گرێدا،دوای شەرِی براکوژی نێوانیان هەلگیرسا تا لە 2002/10/4 جارێکی تر پەرلەمان بە هەموو لیستی بەشدار کۆبوونەوە و (ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی سالّی 1992 قایل بۆوەو کە (49٪) کورسی هەبێت و (51٪)یش بۆ (پ.د.ك)، تا هەلّبژاردنی نویّ و ناوی لیّ نرا پەرلەمانی ئینتقالی.

ئەو رێژەیەی کە هاتە سەر دەزگا و پەخش و کارپیّ کردن لەو فەترەیە (49٪)ی یەکێتی و لە 51٪ی (پ.د.ك)، رێژەی راستەقینە نیە، بەلّکو ئەوە زیادەی دەنگی ئەو حزبانەن کە دەنگەکانیان نەگەیشتە رێژەی یاسایی لە 07٪ کەوا رێکەوتبوون ،بەو شێوەیە هەریەکە لە بزوتنەوەی ئیسلامی وسۆشیالیست وحزبی شیوعی نەگەیشتنە لیڤل و کورسیان نەبوو ، پەرلەمان پێك هات لە : پارتی50کورسی ویەکێتی 50کورسیو باقیەکەی تریش 11کورسی بۆ حزبی تورکمان حزبی مسیحی .کەواتە هەر ئەو فراکسیۆنانەشن بەشدارن لە بەیانی فیدرالی .

**ڕیشەی فیدرالی[1306] لە کوردستان ولە عێراق:** لەبەر ئەوەی تا ئەو ساتەش لە نێوهەندیّ لە زانایانی عەرەب فتوای حرامی فیدرالی دراوە بە بیانۆی جیانەبوونەوە لە پەیکەری ئیسلام،لەوانە تەقەلاکەی 1964 ئینجا هەندیّ فتوای (اخوان المسلمین)وفتوای عبدالملك سعدی وزۆری تر، پێویست بەوە دەکات هەلوەستەیەکی دوو سەرەی بۆ بکەین یەکیان بە ئارِستەی (ڕەوایی وناڕەوایی) دوەمیان بە ئاڕستەی مێژووی پیادەکردنی ئەزمونی فیدرالی لە کوردستان وعێراق ،لەلایەکی تریش ئەو ڕیشەیەی باسی دەکەین خۆی لەخۆیدا زەمینەیەکی میژوویی وئاینی وئینجا یاسایی بۆ فیدرالی

---

[1306] سەبارەت بە زاراوەی فیدرالی لە (موسوعەی جودی بەشی –1– ببینە)

دروست دەكەن .

**ئەزمونی مێژوویی :**

1- بونی هەرێمی كوردستان بە سنورێكی دیاریكراو زیاتر لە 8سەدە ، كوردستان لەپێش سەدەی (12)وەك زاراوەیەكی كارگێڕی بەكارهاتووە لێرەو لەوێ، لەساڵی 1339ز كەوتە سەر نەخشەی ئیبن مستەوفی بۆ یەكەمجار، بە فەرمی لە لەدوای سەدەی 17 وەك نەخشەی ئیداری بۆ (5)ویلایەت ناوی كوردستانی لێنرایتەوە، یەكەم وەرچەرخانی بۆ زاراوەیەكە سیاسی لەلایەن شیخ عبیدالله هاتە كایەوە، لە دوای ئنقلابی 1908 ودوایش لە دانوستانەكانی سالانی 1912 تا 1920نێوان عوسمانی وكورد بەسیاسیانە بەرجەستە بوو، لەكۆنگرەی سیڤەری1920یش بەیاسایی بوو، بەوشێوەیە لەسەرەتای سەدەی بیستەم كوردستان بەجیا لە وڵاتانی ناوچە زووتر مانائیداری و سیاسی و یاسایی خۆی وەرگرت ، دەتوانین بڵێین پیش كۆنگرەی مونتیفیدیۆی 1933 كوردستان گوزارشی لەوپەیوەندیەی نێوان(هەریم ومیلەت ودەسەلات)كردوە،كە لەمادەی یەكی ئەو كۆنگرەیە هاتبوو،ئیستاش ئەومادەیەبنچینەیەكی یاسایی بەهیزی یاسای‌دەولیە بۆ بوون بە دەولەت یان مافی چارەنوس بەگشتی ولە نێوانیشیاندا فیدرالی .

2- هەر بەگشتی خلافەتی ئیسلامی لامركزی ویلایات بوو فراوان تر لە فیدرالی ، ئەو ناوچەیەی ئیستا ناوی نرا عێراق یەك ویلایەت نەبووە ، بەلكو هەر ویلایەتیش نەبوە بە ناوی عیراق ،تەنها لەسەردەمی عەباسی ئەویش سنوری سەرووی نەگەیشتۆتە تكریتیش ،ویلایەتەكانی شارەزور(دوای بوە موسل)،بەغدا،بەسرە هەبوە.

3- ئەو ناوچەیەی ئیستا هەریمی كوردستانی پیدەوتریت كە مەیدانی باسی فیدرالیە ئەوا دەسەلاتی كوردی لە میرنشین ودەولەتی كوردی لێبوە .

4- عیراق لەدوای داروخانی عوسمانی ئینجا دروست بوە لە چوارچیوەی پرۆژەكانی ئیستعماری بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست و سایكس پیكۆ ..،كوردستان پەیوەندی بە عیراق

نەبوە ،پرسیکی نوێیە ، بەمەرج خراوەتە سەر عیراق کەلە بڕگەی داهاتوو باسی دەکەین

.

**ڕەهەندەیاساییی وسیاسیەکانی فیدرالی کوردستان:**

لەوانەی سەروو بەسانایی ڕەهەندەسیاسیەکەی دیاری دەکرێ ولە چوارچێوەی دیاری کردنی رەهەندە یاساییەکانیش بۆی تەواو دەبێ ، بوونی کوردستان وەك ویلایەت زەق ترین بنچینەی یاساییە بەلام هەندیکی تر لە بناغە یاساییە بەهیزەکان هەلدەبژێرین :

1- لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی کوردستان خاوەنی دەسەڵات و هەرێمی خۆی بووە، شەرعیەتیشی هەبووە بە پێی ڕێکەوتنی سولتان-بەدلیسی، دوای ویلایەتێکی سەربەخۆش بەناوی ویلایەتی کوردستان هەبوە،یەك لە والیەکانی (حمدی پاشا)ی کورد بوە[1307]، لە دوا ساتەکانی تەمەنی عوسمانیش بەپێێ بروسکەی عەلی ئیحسان پاشای نوێنەری سوڵتانی عوسمانی لە 1918بۆ شێخ مەحمود کە دان بە حکومەتی شێخ مەحمود دەهێنێ لە کوردستان .

2-لە دوای ڕووخانی عوسمانی ودروست بوونی دەولەتانی ناوچەکە ،کوردستان وعیراق هەریەکەبە ماددەیەك لە عوسمانی جیابوینەوە، کوردستان بە مادەی(62)ی سیڤەر ،کەچی عێراق بەپێی ماددەی (94).

3-لە رێکەوتنە نێودەڵەتیەکان،.. بە پێی یاسای نیودەولەتی (بەتایبەتی مادەی یەکی مۆنتیڤیدیۆ)کوردستان خاوەنی هەرسێ پای دەوڵەت (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی) چجای فیدراڵی بوە،کەمەشمولەبە مادەی (1)ی بەشی یەکەم و ماددەی (55)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان،مادەکانی(58-60)ی (فصل العاشر- قبول أعضاء جدد)ی (مجلس الأمن)،بڕیارەکانی ژ:1514ی خولی(15)ی 14/دیسمبر/، 1960، بڕیاڕی ژ: 2105 خولی (20)ی دیسمبری 1965، بڕیاڕی ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 ، بڕیاڕی ژ: 3070خولی(28)ی نوڤمبری 1973 .

---

[1307] بڕوانە :الكرد في الوثائق العثمانية – د عثمان علي ص114 ،ص115 ص118،ص120،ص121لە یەکێ لەو بەلگەنامانەی بەمۆری والی کوردستان کراوە بەناوی(احمد عزت).

4- لکاندنی کوردستان بە عێراق مەرجی یاسایی وسیاسی نێودەولەتی زۆر توندی هەبوە (راپۆرتی ویلایەتی موسل ص228)سەبارەت بە یەکگرتنی عیراق وکوردستان ،ئینجامادەی 16ی ئینتداب، مادەی4ی کۆنگرەی قاهیرە، دان پیا هێنانی بەریتانی لە 1919 بە چارەنوسی کوردستان وجاریکی تر لەگەل عێراق لە2/دیسمبر/ 1922، بڕیارەکانی خولی (16)ی مانگی 1925/12ی عصبە سەبارەت کورد ،10 بەلێننامەکەی سالی 1932 کە بە(عصبەالامم)درابەتایبەتی (تەعەهودی ژ:9و10)...،دوایش بەندی (7) و بڕیاری 688، بڕیاری 986کە ڕێژەی 13٪تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاری کرا لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان...، یاسای انتقالی 2003، تا دەگاتە دەستوری تازەی عیراق کە بەدەستوری فیدرالی ناوزەد دەکرێت .

5-ڕەهەندە یاساییەکانی فیدرالی عیراقی لەسەر ئاستی عیراقی:

لەدوای دابەشیەکانی سایکس پیکۆ و تەواو کردنی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە کۆنگرەکانی سان ریمۆو سیڤەر ،ئینجا کۆنگرەی قاهیرە بڕیاڕی نێو دەولەتی باشوری کوردستان بە عیراق لکیندرا ، بۆ دیزاینی سیاسی عیراقی داهاتوو کۆمەلێك سیناریۆی سیاسی ویاسایی هاتە مەیدان ودوای دروست بوونی دەولەتی عیراقی بریتین لە بنچینەی فیدرالی ،کە ئەوانەی خوارەوەن:

أ-پرۆژەی بەریتانیا لە پیش دروست بوو نی دەولەتی عیراقی لە 1920 بەو شێوەیە بوو : ( ناوچەکانی شیعە سەربەخۆ بیت -ئیدارەی بەسرە لە بەغدا جیا بیت وکویتیشی بخریتە سەر - بەغدا مەملەکەتێکی سەربەخۆ دەبێت ودەدریتە پادشایەکی عەرەبی - هەمو ئەوانە تەنها بەناو عەرەبی لە ژێر دەستی بریتانیا دەبیت)[1308] ،لەو سیناریۆیە کوردستانی تێدا نەبوو .

ب-بۆ دروستکردنی دەولەتی عێراقیش پرۆژەی لۆرانس بۆ(2) هەرێمی عێراقی بەناوی (عێراقی سەروو-بەغدا بۆ مەلیك عبداللەی براگەورەی مەلیك فەیسەل)، (عێراقی خواروو-

[1308] موسوعە العراق السیاسیە ص93 .

بەسرە بۆ ئەمیر زەیدی برا بچوکی ) مەلیك فەیسەلیش بۆ سوریا دیاری کرابوو[1309]، دیسان کوردستانی تێدا نەبوو.

ج-لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ بناغەی سێ دەوڵەت لەخواروو (کەربەلا 1918-1920) و ناوەڕاست (بەغدا 1920-...) و لە کوردستان (سلێمانی 1918-1923) دروست بوو.

د-تەقەلاکانی دروستکردنی فیدراڵی لە خواروو لەسەر دەستی خەلکی بەسرەش بەلایەکی تر هەبوە ،لەوانە : (1-پرۆژەی لۆرانس بۆ سەربەخۆیی بەسرە، پرۆژەی لکاندنی بەسرە بە دەسەلاتی هندەوە، پرۆژەی فیدراڵی بەسرە بە سەرۆکایەتی تالیب پاشا، دواییش پڕۆژە بە ناوبانگەکەی 1921/6/13ی خەلکی بەسرە لە کەسایەتیە بەناوبانگەکان ومەسیحی و یەهودیشی تیایدا داوایان کردبوو سەربە خۆیی بدرێتە ویلایەتی بەسرە[1310] .2- تەقەلاکانی فراتی ناوەڕاست کە بریتین لە: حکومەتی کەربەلا، شۆڕشی (20)، تەقەلاکانی أ.کاشف غیتا، هاوپەیمانی فراتی ناوەڕاست و بەکر سدقی، بەگشتی هاریکاری رابەرانی شیعە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحمود، مەلا مستەفا.

ع- بنچینەی فیدرالی لە ڕێکەوتنامەکانی کوردو دەولەتی عیراقی( قرار مجلس الوزراء 11/تموز/1923 - بیان شباط 1964 - بیان 29/حزیران/1967 - اتفاقیة آذار 1970 - قانون الحكم الذاتی لعام 1974) .

ف- بنچینەی فیدرالی لە مادە دەستوریەکانی عیراقی ( المادةالخامسة من القانون العراقي الأساس لعام 1925 – المادة الثالثة من دستور 1958 -المادة واحدة والعشرين من دستور 21 أيلول 1968 المؤقت 1964- تعديل (الدستور1968) وفق اتفاقية اذار لعام1970 – المادة الخامسة من الدستورالصادر في 16 يوليو 1970 – المادة السادسة من مشروع دستور العراق الصادر في في 7 تموز 1990 –المادة الثالثة والخمسين من قانون

---

[1309] بروانە : د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق ق1ج5ص58

[1310] بروانە :عبدالرزاق الحسنی –تاریخ الوزارات ج1 ص100.

إدارة الدولة المؤقت فى العراق - المادة الاولى الى اربعة ثم المواد مئة وسابعة والعشرين الى المئة والعشرين) من دستور الجمهورية العراقية -2005 ) .

ق- مادەی (1)ی یاسای ئالای عیراقی سالی 1931 دەقەکەی :

قانون شعار الدولة العراقية رقم 25 لسنة 1931

استناد

نحن ملك العراق

بموافقة مجلسي الاعيان والنواب امرنا بوضع القانون الاتي : -

المادة 1

يتالف شعار الدولة من رقعة ملونة بالوان العلم العراقي الاحمر من فوق فالاسود فالابيض فالاخضر تضمها حاشية مذهبة وفي طرفيها العلويين ضمتان يتكون منهما زهرتان مربوط كل منهما بشريط مذهب متشابك على شكل ذوابة . ويعلو الرقعة التاج العراقي مستندا الى كوكبين ذوي سبع شعب مزخرفة تحوي الوان العلم العراقي رمزا الى العنصرين العربي والكردي وفي وسط الرقعة ترس ذو اطار مكتوب في قسمه الاعلى بالخط الكوفي (العدل اساس الملك) وفي قسمه الاسفل (1339) وهو التاريخ الهجري الذي تبوا فيه جلالة الملك فيصل الاول عرش العراق وعلى طرفي الاطار ما بين الكتابتين نقوش من الطراز العربي وفي وسطه اربع نخلات يرى خلفها في الافق جبال متصلة بالسماء الزرقاء الفاتحة اللون وابار نفط ويجري من فوق نهران يرمزان الى دجلة والفرات ويلتقيان في اسفل امام النخيل رمزا الى شط العرب ويتقاطع في ملتقى النهرين سيف ورمح – الاول من الجهة اليمنى والثاني من اليسرى . ويسند الترس جواد عربي من الجهة اليمنى واسد بابلي من الجهة اليسرى وفي اسفل الرقعة تحت الترس يتقاطع غصن قطن ورابطة قمح ذات سبع سنابل .

المادة 2

يسنّ نظام خاص لتعيين المناسبات التي يستعمل فيها شعار الدولة والاماكن الرسمية التي يعلق عليها .

المادة 3

يلحق بهذا القانون انموذج مصدّق من شعار الدولة .

المادة 4

على هيئة الوزارة تنفيذ هذا القانون .

كتب ببغداد في اليوم الثالث من شهر اذار سنة 1931 واليوم الثالث عشر من شهر شوال سنة 1349 .

فيصل

| | | |
|---|---|---|
| عبد الله الدملوجي | رستم حيدر | نوري السعيد |
| وزير الخارجية | وزير المالية | رئيس الوزراء |
| | | ووكيل وزير الداخلية |
| مزاحم الباجه جي | جميل الراوي | جمال بابان |
| وزير الاقتصاد والمواصلات | وزير الدفاع | وزير العدلية |
| | عبد الحسين | |
| | وزير المعارف | |

**تێڕوانینی عربی بۆ فیدرالی:** نمونەی فیدرالی لە وولاتانی پیشکەوتو ئارام گەلیٚ زۆرە ، لەوانە لە دەستوری بەلجیکا لە مادەی(1) باسی ئەو فیدرالیە دەکات ،لەمادەی(2)باس لە 3یەکەی بنچینەی بەلجیکا دەکات(فرنسی وفلامندی وجەرمانی)،لەمادەی(3) دەلیٚ بەلجیکا لە3هەریم پیکهاتوە (فالۆنی-فلامەندی-برۆکسیل)لەمادەی(4) باسی چوار زمانیش دەکا (فرنسی —هۆلندی-برۆکسیلی-ئەلمانی)..کەچی وولاتیکی ئارامەو مەترسی دابەش بوونی لەسەر نیە . ئەوەبەلجیکا بوو کەچی بەشی زۆری تەیاری عروبی بە چاوێکی گومان سەیری مافی غەیرەعرب دەکا لەناوچەکەو توومەتی پیلانی ئیستعماروزایۆنی ئامادەیە ، بۆ هەر مافیکی ئاوا یەکسەر باس لە (تقسيم المقسم وتجزئه المجزأه) دەکەن ،دەلێن ئەوە دابەشی وجیاوازی خوازیە ،لەزۆربەی بەلگە نامەکانی فەرمی هاتوە جاریش وابوە گەلەکۆییان لەو میلەتە ژێردەست وبێچەکە کردوە ، لەسالی 1963لە هەلمەتی یەکەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەکان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا بەپێی مادەی(2)ی (معاهده الدفاع المشترك بين دول الجامعه العربيه)کە لە 1950/4/13 مۆرکرابوو، لەوێشەوە بۆ هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە 1963/10/8بەسترا بوو ، بەدەگمەن بەلگەنامەیەکی تەیاری عروبی دەدۆزیەوە لایەنگیری فیدرالی ،بۆیە لەسەری ناوەستین، ئەوەی لەسەری دەوەستین هەردوو مەدرەسەی شیوعی وئاینیە ،چونکەئەو گوتارە توندە میشکی بەشیکی زۆری شیوعی وئاینیەکانیشی گرتۆتەوە،بۆیە چەندین فتوا دراوە دژی فیدرالی ،لەبەرامبەریشدا فتوای پیچەوانەش هەیە ، زیاتر لەوەش گەیشتنی بەشیوعیەکانیش کە گوایە ئەوان خاوەن ئایدیۆلۆجیای ئومەمین وباوەڕیان بەمافی چارەنوس هەیە بەپێی ( قرار المؤتمر الأممي المنعقد في لندن عام 1896)[1311]، جیاوازی ئەو دوولایە لەگەل تەیاری عروبی ئەوەیە یەکەمیان بەلای کەمی دان بە

---

[1311] " يعلن المؤتمر تأييده لحق جميع الأمم التام في حرية تقرير مصيرها ويعرب عن عطفه على عمال كل قطر يقاسي آنيا نير الاستبداد العسكري أو القومي أو غيرهما، ويدعو المؤتمر عمال جميع هذه الأقطار إلى الانضمام إلى صفوف العمال الواعين

هاوولاتی بوونی کوردیان کردوە ،بەلام دوەمیان (عروبی) جاروایە نکولی لە بوونیشی کردوە ، هەلبەتە مافی هاوولاتی بوون ومافی پیکهاتەیی لیکجیان لە ڕووی سیاسی ویاسایی .

کەمتر بزوتنەوەی ئیخوان و تەیارە ئیسلامیەکانی عیراقیش چارەسەری کیشەی کوردیان لە ستراتیژ و پرۆگرامەکانیان هەبوە ، یان بە ڕاگەیەنراوێکی نارەزاییان لیَ نەبینراوە کە لەدژی ئەو تاوانانەی دژی کورد کراون، هەرچەندە هەلویستی شەخسی هەبووە بەلاّم بەناوی ئیخوان نەبووە ،تەنانەت لە (بلاّوکرایەوەکی ئیخوانی عیراق ژ:3)دروست بوونی دەولّەتیَکی کوردی بە (حرامی شەرعی) وەسف کراوە،کەچی لە بلاّوکراوەی 28/ئایار/1964 لەبارەی(میثاق الوحدة العربية) بەتایبەتی وحدەی عیَراقی ومیسری ئەوسا بەتوندی لایەنگیری کراوە،ناشبیَ ئەوەش لەبیربکەین لەهەمان کاتدا دژ بەوهەلمەتەی حکومەت بووینە بۆ سەرکورد وبنەمای(هاوولاّتی بوون)یان کردۆتە چارەسەر[1312]،جاریش وایە زیاتر لەوە یارمەتی کوردیان داوە بوویتە هۆی توومەت لەلایەن حکومەت[1313]، حزبە شیعەکانیش بەو ئاڕستە بووینە دژی کورد نەبووینە بەلام چارەسەریان لە چوارچیَوەی ئامانجە دوورو گشتیەکان ڕیَزکردوە .

---

أي الواعين لمصالح طبقتهم في العالم أجمع، للنضال معهم في سبيل التغلب على الرأسمالية العالمية وتحقيق أهداف الاشتراكية الديموقراطية الأممية".

وتبنى (لينين) هذا القرار : "بما أن هذا الحق قد أخذ به بصورة ميكانيكية نقلا عن قرار مؤتمرالحزب الاول (1898)، الذي أخذه بدوره عن مقررات المؤتمرات الاشتراكية الأممية، وهو .. تقرير المصير السياسي، أي تقرير مصير الأمم باتجاه الاستقلالالسياسي. وعليه فان صيغة تقرير المصير القومي، التي تعني حق الانفراد بالكياناالجغرافي،..

إن حق تقرير المصير، من وجهة نظر الماركسية عموما، لا يثير أية صعوبة. فليس ما يدعو جديا إلى الاعتراض على قرار لندن الصادر في عام 1896 ولا إلىفهم حرية تقرير المصير بمعني آخر غير معني حق الانفصال.

[1312] بڕوانە: الإخوان المسلمين فى العراق(1959-1971)-دكتورە ايمان عبدالحميد دباغ -ص590 ،ص579 ئەو هەلویستەی د قرزاوی و هەندی زانای تری عەرەب لە بارەی حرامی جیابوونەوەی خوارووی سودان بەهەمان پاساو بووە، گوایە جیا بوونەوە لە جسمی ئیسلام حەرامە! هەلەکوشندەکە لەوەیە کوا ئەو وولاتانەی عربی جسمی ئیسلامن ئەوانە بەدەستورو ئینتماوە عەلمانین دوور لە ئیسلام.

[1313] الإخوان المسلمين فى العراق ص591)-نوسراوی ژ:م ا ب/5860لە 1962/9/23 ئاسایشی عیَراق .

هەرچی هەلویستی دام ودەزگای دەولەتی عربیە خراتر بووینە ، لەسەردەمی هەلمەتە ئەنفالیەکانی عبدالسلام عارف بۆ سەر کوردستان لە 1963-1964 کۆنگرەیەکی ئیسلامی رێکخست لە بەغدا زانایەکی زۆر ئامادە بوون لەوانە (شیخی ئەزهەر) بۆ ئەوەی بە فتوا کورد بە یاخی (مارق) هەژمار بکەن بە پێی ئایەتی:(إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)،خەریك بوو سەرکەوتوو بیت ، بەلام لە 5ی تەموزی 1965 فتوا بە ناوبانگەکەی محسن الحکیم دەرچوو دژ بەو کۆنگرەو دژ بە شەڕی کورد.

تەنانەت حزبی شیوعی تاڕادەیەك هەلویستی بـاش بـوو بـە پێـی بـارودۆخی پەیوەنـدیان لەگـەل دەسەلات ،ئەویش لە کـاتی هەلگیرسـانی شۆڕشـی ئـەیلول بـەیانیکی لـە 1961/8/22 دەرکـرد تیایداجم وجۆلی بەرگری چەکداری کوردستانی بـە دەسـتی ئیمپریـالیزم وئـەمریکا لەقەلـەم داو لـە بەیانەکە واهاتبوو: (في الفترة بين 20 - 23 تموز 1961، اجتمع السفير الأمريكي في إيران (هـولمز) وبمساعدة الملحقين العسكريين الأمريكان وقنصل أمريكا في مدينة رضائية الإيرانيـة - بعـد أن نظمـوا سفرات في المناطق الكردية من إيران واتصلوا ببعض الشيوخ والأغوات - وفي نفس الوقت قـام رئـيس الاستخبارات الإيرانية ببعض السفرات المريبة في المناطق الكردية من إيـران. وكانـت بـاكورة النشـاط التآمري الأمريكي على الجمهورية العراقية إرسال علي حسين أغا المنكوري على رأس عصابة مسلحة بالأسلحة الأمريكية بإشـراف مبعـوثين أمـريكيين والسـلطات الإيرانيـة، وقـد اجتـاز الحـدود العراقيـة ليفرض سيطرة عصابته المسلحة على ناحية ناودشت ويعتـقل بعض موظفيها) . دوایش کـە شۆڕشـی نوێ لە 1976 هەلگیرسایەوە بەبەیانێك لەسالی 1978ئەو شۆڕشەی بە کرێگرتـەی ئیمپریـالیزم وەسف کرد،دەقەکەی وا هاتوە:(..ئیمپریالیزم وولاتانی رەجعـی ناوچـەکەیارمەتی عەناسـری دژ بـە عێراقـی پێشکەوتووونیشـتمان پـەروەردەدەن..). لـەکۆنگرەی 3ی 1976ی (ح ش ع) ڕووخـانی شۆڕشی ئەیلول بەدەسکەوتێکی گەورەی وەسف کردو ئەو شۆڕشەی بە (رجعی)لـە قەلـەم دابـوو وەك لــەدەقی بەیانەکــەی واهــاتوە:(..وفـی مقدمـة المنجـزات الجبهـة الوطنيـة الحکـم الـذاتی وقضـية التمردالرجعی الکوردی)،هەولویستی سۆڤیەت وزۆربەی وولاتانی سۆشیالیسـتیش بـەو شـێوەیە بـوو

،سۆڤیەت عیراقی پڕچەك كرد دژی كورد تەنانەت جاروابوو فرۆكەوانی سۆڤیەتی (له جۆری تۆپـۆلیڤ 22) سەنگەری پیشمەرگەی دەكوتا له قازانجی حزبی بەعس، دروشم كۆنگرەی 3ی (ح ش ع) بریتـی بوو له :(دەست لەناودەست بۆ پێشەوە بەرەودامەزراندنی سۆشیالیزم له عێراق) [1314].

<u>**بناغەی شەرعیەكانی فیدرالی**</u> : لەبەر ئەوەی تا ئیستا موفەسیران ئایەتیكی ڕاشكاوانەیان نەدۆزیتەوە پالپشتی فیدرالی بكا ،لەهەمان كات هیچ ئایەتیكیش پیچەوانەی نیە ..بۆیە فتوای شەرعی دەبێتە بنچینە ، بۆشەرعیەت بوون فتوای مامۆستایانی كوردستان كافیە ،وەك ئەو فتوایەی لەخواروو تۆماركراوە ،بەلام بەوە بەهێزتر دەبێت كەفتوای تر لەدەرەوەی هەریمی كوردستان و دەرەوەی میلەتی كوردیش هەبێت ،وا هەندیكی لەوانە تۆماردەكەین :

1-لەبنەچەدا كۆمەلێك فتوا هەیە دژی دروست بوونی دەولەتی عیراقی وبەشداری كردنی بە(مرتد)وەسف كراوە ،لەوانە فتواكەی (مهدی خالصی) هەروەها شۆڕشی دژی كرا بە سەرۆكایەتی محمد شیرازی .

2-ئەدمۆندز لەكتیبی(the Kurdish war) دەلێت عەرەبەكان ئینگلیزیان دژی كورد بەوە ئیقناع كرد ووتیان ئێمە لەجەنگی جیهانی لایەنگری هاوپەیمانان وئینگلیز بووین ،كەچی كورد لایەنگری خەلافەتی ئیسلامی كرد دژ بە ئینگلیز [1315] .

3- فتوای سیستانی مەرجەعی بالای شیعەی عیراق ( دەقی فتواكەی 24ذی الحجة11424)سەبارەت بە فیدرالی كە لە وەسیقە رقم53 دەرچوە ،ئەوە دەقەكەیەتی: ((ان اصل الفدرالیة ونوعهاالمناسب للعراق،.. ومن المؤكد ان ممثلی الشعب الكوردی العزیزفی مجلس كتابة الدستور سیتوصلون مع سائر اخوانهم العراقین الی صیغة مثلی تحفظ وحدةالعراق كما تحفظ الحقوق جمیع اعراقة وقومیاته)) [1316].

---

[1314] تقریر السیاسی المؤتمر الثالث للحزب الشیوعی العراقی 1976.

[1315] بۆ زیاتر بروانة : د حامدمحمودعیسی- المشكلة الكردیة فی الشرق الاوسط ص52.

[1316] النصوص الصادرة عن السید السیستانی فی المسألة العراقیة ص280.

4- فتوای کۆمەلیك مامۆستای ئاینی عیراقی ئەوەی خوارەوە دەقەکەیەتی :

بسم الله الرحمن الرحيم

بيان في حكم الفدرالية

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين وبعد لقد أثير جدل في الآونة الاخيرة حول حكم نظام الأقاليم اوالفدرالية لذا نود أن نبين بعض الأمور

أولا: من الناحية المنهجية نرى أن مثل هذه القضايا العامة التي تتعلق بالسياسة الشرعية، ولها آثار كبيرة يجب الرجوع فيها إلى الفتاوى الجماعية من خلال المجامع الفقهية، أو من خلال مؤتمر يضم أكبر عدد من العلماء والسياسيين والخبراء من أهل الذكر، حتى ينظروا في المسألة من جميع جوانبها، وحتى تكون بعيدة عن الحساسيات و للوصول إلى رأي متوازن في الحكم .

ثانيا: إن نظام الولايات والأقاليم كان سائدا منذ عصر الخلافة الراشدة، حيث كانت أقاليم أو ولايات الخلافة تقسم على مكة المكرمة، والمدينة المنورة، ومصر، والشام، والبصرة والكوفة وفارس، وغيرها. وقد ذكر الأستاذ الدكتور أكرم العمري وأ.د. علي الصلابي تفصيلا خلاصته أن نظام الولايات قد بدا في عصر الرسول الكريم صلى الله عليه وسلم، كاليمن، والبحرين وحضرموت ثم ظهرت ولايات جديدة في عهد الراشدين كالبصرة والكوفة وأما المدينة فهي عاصمة الدولة يتولى إدارتها الخليفة مباشرة. وكانت سياسة عمر بن الخطاب رضي الله عنه انه كان يختار واليا من القوم إذا وجده كفئا، حيث ولى جرير بن عبد الله البجلي على قومه بجبلة، وولى سلمان الفارسي على المدائن، ونافع بن الحارث على مكة ، وعثمان بن أبي العاص على الطائف يقول أ.د. أكرم العمري:" أن معظم الولاة على اليمن- منذ عهد الرسول (ص) إلى عهد عمر (ض) كانوا من أهل اليمن"، وكان واجب الولاة هو ما يأتي:

1- إقامة أمور الدين وتحقيق العدل للجميع.

2- حماية مصالح البلاد والعباد، وتحقيق الأمن والأمان، وتوفير احتياجاتهم.

3- الولاء لسلطة الخلافة.

4- وأما الأموال من الصدقات والفيء، والعشور فالأولوية لأهل الإقليم ثم ما فاض يكون للمركز حسب الاتفاق أو الطلب استنادا إلى أمر النبي عليه الصلاة والسلام لمعاذ بن جبل حينما أرسله إلى اليمن" خذها – أي الصدقات – من أغنيائهم وردها على فقرائهم . "

5- أن وثائق الولاية التي كانت تصدر من الخليفة الراشد عمر بن الخطاب رضي الله عنه تدل

بوضوح على أن للولاة صلاحيات واسعة في حدود إقليمهم، وان دور الخليفة هو التوجيه، والمراقبة، والمتابعة، لتحقيق العدل بين الناس والدعوة والتعليم.

ثالثا: أن نظام الحكم في الإسلام لم يكن مركزيا بحيث يستبد الخليفة بكل مقاليد الحكم، بل كان للولاة سلطات واسعة في تعيين كل العمال والموظفين في أقاليمهم ومحاسبتهم بالتشاور مع أهل الخبرة، وكانوا مسؤولين عن الشؤون المالية والاقتصادية، ولكن كانوا يخضعون لمراقبة الخليفة في تحقيق العدل والأمن والخير لأهل الولاية ، ولا يلتقون به إلاّ مرة واحدة عند الحج.

وقصدنا من هذا العرض الموجز أن الوحدة الإسلامية لا تعني الإدارة المركزية، ولا إلغاء الأقوام والشعوب، وإنما الوحدة التي تجمع الشعوب الإسلامية هي وحدة العقيدة، والمشاعر، والشعائر، والولاء والنصرة التي تؤدي بالضرورة بإذن الله تعالى- إلى وحدة سياسية طوعية في القريب العاجل.

رابعا: أن وحدة العالم الإسلامي هي أمنية جميع المسلمين، بل هي فريضة يجب أن نسعى إليها بكل إمكانياتنا، ولكنها غير موجودة في الجانب السياسي، فعدد الدول الإسلامية يفوق خمسين دولة. ولكن هذه الوحدة من حيث العقيدة والمشاعر والشعائر والانتماء موجودة — والحمد لله — وعلينا السعي الدائم لتحقيقها سياسيا ، ولا احد يقول من فقهاء القانون الدستوري: أن نظام الأقاليم أو الفدرالية هو تقسيم وتمزيق للدولة، فأقوى الدول اليوم في العالم مثل أمريكا تقوم على النظام الفدرالي، كما أن هذا النظام مطبق في كثير من الدول في العالم ومنها ماليزيا وغيرها .

خامسا: إن القول بتحريم نظام الأقاليم والولايات، (أو ما يسمى بالفدرالية (في ظل الدولة الاتحادية الواحدة، ليس بالأمر اليسير وجميع الآيات والأحاديث التي ذكرت في فتاوى التحريم هي في دائرة تمزق الأمة الواحدة وخروج فئةٍ باغيةٍ على الخليفة العادل الذي يقيم العدل، ففي هذه الحالة نحن جميعاً مع تنزيل هذه الأدلة عليها ، في حين أن موضوع "نظام الأقاليم" في ظل الدولة وعدم الخروج عليها ظلماً وعدواناً لا يدخل في باب تمزيق الأمة والمس بوحدتها، فالفدرالية هي نظام إداري اتحادي يحافظ على الوحدة إن أُحسن استعماله والنظام السياسي في الاسلام واسع لكل إدارة ناجحة ما دامت لا تتعارض مع نص صريح من الكتاب والسنة.

والخلاصة أن الإشكالية في الفتوى فيما يأتي :

-1استعمال لفظ التحريم في مسألة اجتهادية، مع أن السلف الصالح والمحققين من العلماء لا يستعملون هذا اللفظ إلا في محرمٍ مقطوعٍ بحرمته .

-2عدم تحرير محل النزاع، وذلك لأن النزاع ليس في حرمة تمزيق الأمة، وإنما الحديث في نظام (الإقليم) أو (الفدرالية) التي هي أشبه ما تكون بنظام الولايات في ظل الخلافة الراشدة .

3- إن مثل هذه الفتاوى المتعلقة بشعب أو طائفة كبيرة لا ينبغي أن ينفرد بها عالم واحد — مهما علت مرتبته — بل يجب عرضها على المجامع الفقهية، أو مؤتمر كبير —كما سبق .

4- إن فقه تنزيل النصوص، وتحقيق المناط يدلاّن بوضوح على أن تلك الآيات الكريمة والأحاديث النبوية الشريفة اللتي استشهد بهما بعض الفضلاء لحرمة الدعوة الى نظام الأقاليم ، لا تنزل على الواقع العراقي،الذي تعاني طائفة معينة فيه من الإقصاء والتهجير والتشريد والاعتداءات حتى على الأعراض، ثم هي تطالب بحقها في إدارة نفسها في ظل الدولة العراقية الموحدة، بل إنها معرضة لتغيير هوية بلادها، فلننظر إلى حالة بغداد قبل الاحتلال وبعده، بل فلننظر إلى حالة سامراء قبل الاحتلال وبعده، فهل تكون المطالبة( بأن تدير نفسها بنفسها في ظل العراق الاتحادي الموحد حتى تحمي نفسها،) مسألة محرمة؟

سادسا: إننا نطالب بالوقوف مع الشعب العراقي المعتصم في الوسط، وتأييد مطالبته العادلة بحقوقه في ظل العراق الموحَّد ولقد طالب العلماء مرارا هذه الحشود بالمحافظة على سلمية حراكهم والتمسك بوحدة الصف والكلمة لذا نرجو من إخواننا العلماء الأفاضل أن ينتبهوا لمسألة في غاية الخطورة خلاصتها أن إصدار فتاوى فردية في قضايا السياسة الشرعية في هذه المرحلة ستؤدي الى تشتيت الجهد وشق الصف واختلاف الكلمة مع احترامنا الشديد لأصحاب هذه الفتاوى وتقديرنا لمنزلتهم العلمية ومكانتهم الجليلة وفقهم الله ورعاهم

هذا والله أعلم بالصواب

الموقعون :

1- أ.د. علي محي الدين القرداغي الأمين العام للاتحاد العالمي لعلماء المسلمين

2- الشيخ د. محمود عبد العزيز العاني الأمين العام لمجلس علماء العراق

3- الشيخ د. عبد الستار عبد الجبار نائب الأمين العام لمجلس علماء العراق

4- الشيخ عبد الحميد الريكاني

5- الشيخ محمد عمر عبد العزيز

6- الشيخ طايس الجميلي

7- أ.د. صالح عبد القادر زنكي

8- الشيخ د. أحمد عبد الوهاب البنجويني

9- الشيخ د. سامي رشيد الجنابي

10- د. طه الدليمي

11-الشيخ د. حسام السامرائي

12-الشيخ د. محمد عياش الكبيسي

5- فتوایەکی تری (اخوان المسلمین)ی بەشی سوریا هەیە دان بە بوون وتایبەتمەندی کوردستانی رۆژئاڤا دەنیت ،لەبەر ئەوەی یەکەم جارە لە قۆناغی نویٚ بۆیە بلاوی دەکەینەوەو بەناڕاستەوخۆ پالپشتە بۆ فیدرالی کوردستانیش (الاعتراف بالخصوصية الكردية والحقوق الثقافية للإخوة المواطنين الأكراد لندن في 17 أيار (مايو) 2005- جماعة الإخوان المسلمين في سورية ) .

6-فتوای زاناو مامۆستایانی ئاینی کوردستان زۆرە بەلام بەشێوەی فەرمی وڕێکخراو ئەو فتوایەیە کە ریکخراوی ستاندەر پێی هەلسا ،ئەوەی خوارەوە دەقەکەیەتی :

الفتوى الشرعية لاستقلال كوردستان

**ضمن نشاطات منظمة ستاندارد الرامية لبناء الدولة الكوردستانية، قامت المنظمة وبالتعاون مع اتحاد علماء الدين الإسلامي بعقد مؤتمر لخمسين عالم وأصدروا الفتوى الآتية:**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**م/ مشروع وثيقة شرعية لاستقلال كوردستان**

**تأسيا بقول الله تعالى: ((يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير))، وبما أن الشعب الكوردي هو الذي اختار الدخول في الإسلام طواعية، ولم يصدر منه أي انحراف عن شرعه الشريف طوال تاريخه، ولأنه ظلم وحرم من حق تقرير المصير وإعلان دولته المستقلة استنادا إلى مؤامرات دولية وفتاوى ظالمة، وبما أن قادة الثورات الكوردية كانوا من العلماء والمشايخ، وإنما قاموا بثوراتهم وفقا لقوانين الشرع الإسلامي الحنيف، وامتدادا لجهودهم العملية في هذا الميدان اجتمع نخبة من علماء الإسلام في كوردستان بدعوة كريمة من منظمة ستاندارد في أربيل، في يوم الأربعاء 2014/3/5، وبعد تبادل الآراء ومتابعة الضوابط الشرعية أصدروا مشروع الوثيقة الشرعية الآتية بشأن استقلال كوردستان:**

**((استنادا للمقاصد الشرعية والأدلة الفقهية، فإن الشعب الكوردستاني له الحق الكامل في تقرير مصيره وإعلان دولته المستقلة، وهذا حق وهبه الله تعالى لهم، وليس لأحد أن يحرمهم منه، وهم بذلك إنما يقررون حقا إلهيا مقررا لهذا الشعب، ويقوون جسد الأمة الإسلامية كما حموا كيانه في السابق)).**

**والله من وراء القصد...**

**ملاحظة: نوصي بعقد مؤتمر موسع للمصادقة على هذه الفتوى ودعمها وتعميمها.**

وەرگێڕانی دەقی ئەو فتوایە بەزمانی کوردی :

دەستەیەك لەزانایانی ئاینی کوردستان لەسەر بانگهێشتی **ڕێکخراوی ستاندارد** بۆ بەدەوڵەت بوونی کوردستان لەبەرواری 5 -3-2014 لە شاری هەولێر لە هۆڵی جودی کۆبونەوە بڕیاریان لەسەر ئەو بەڵگەنامە شەرعیە.

**بسم الله الرحمن الرحيم**

لەژێر رۆشنایی فەرمایشتی خوای گەورە (وجعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا) لەبەر ئەوەی گەلی کورد بە ویستی خۆی ئاینی ئیسلامی هەڵبژاردووەو، بەدرێژایی مێژوو خۆی لە ئاینی ئیسلام لای نەداوە.

لەبەر ئەوەی ستەمی مێژوویی لێکراوە، کەمافی چارەنووس و دامەزراندنی دەوڵەتی پێ ڕەوا نەبینراوە، ئەمەش بەپاڵپشت بە پیلانە نێودەوڵەتیەکان و فەتوا نا بەجێکان، لەبەر ئەوەی سەرکردەکانی شۆرشەکانی کورد لەمێژوودا لە زانایانی ئیسلام بوونە شۆرشەکانیان بەبەڵگەی شەرعی هەڵگیرساندووە.

بۆ دێژە پێدانی کرداری شۆرشگێرانە و دینپەروەرانەی ئەوان لەم مەیدانەدا دەستەیەك لەزانایانی کوردستان ئەم بەڵگەنامە شەرعیەمان دەرکرد.

(( بەپشت بەستن بەمەبەستە شەرعیەکان و بەڵگەکانی فیقهی ئیسلامی، گەلی کورد مافی تەواوی هەیە بۆ دیاریکردنی مافی چارەنووسی خۆی و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بە ڕێگای ئاشتیانە، ئەمەش مافێکی خواییە بەگەلانی بەخشیوە و، ناکرێت گەلی کورد لێ ی بێبەش بکرێت، ئەو

دەوڵەتە کوردیەش پشتی مسولمانان بەهێزدەکات هەروەك چۆن لەڕابردوو ئوممەتی ئیسلامی پاراستوە))

ئەم بەڵگەنامە شەرعیە پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان جێبەجێ ی بکەن و کۆنفرانسێکی فراوانی بۆ ببەسترێت بەمەبەستی زیاتر دەوڵەمەندکردن و پشتگیری کردنی.

.............................................................................

بەڵگەنامەی شەرعی بەرزکراوە بۆ لیژنەی باڵای فتوای کوردستان بۆ پەسەندکردن

هاوپێچ/ ناو و واژوی زانایانی ئاینیی بەشداربو لەکۆنفرانسی رێکخراوی ستاندارد
بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ گەلی کوردستان
هەرێمی کوردستان – هەولێر.

تیبینی : لەچوارچێوەی ململانیی خوارو و سەرووی یەمەن لەبارەی مافی چارەنوسی یەمەنی خوارووی جاران ،کار گەیشتە ناکۆکی نێوان زانایانی هەردووبەش ،بەجۆرێك هەر لایە فتوای پیچەوانەی لاکە دەرکرد ، سەروو دەیان ووت مافی چارەنوس دژبە خوایە لای خوارووش دەیان ووت لەگەل خودایە ، (الهيئة الشرعية الجنوبية للدعوة والإفتاء والإرشاد ) فتوایەکی وەلامی پیکهاتوو لە 8 مادەیی دەرکرد .

**دەقی بەیانی فیدرالی :**

**بڕیاری ڕاگەیاندنی فیدرالی**

**بەیاننامەی ڕاگەیاندنی یەکێتی فیدرالی**

کە جەنگی یەکەمی جیهانی تەواو بوو نەتەوەی کورد وەکو هەموو ئەو نەتەوانەی لە ژێر باری دەسەڵاتی عوسمانی دابوون، بە ئاواتی ئەوەوە بوو قەوارەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروست بکات لەویدا گەورەی خۆی بێ. بەڵام بەرژەوەندی هەمەلایەنی هێزە سەرکەوتووەکانی ئەو جەنگە کە کلیلی کار و چارەسەریان بەدەستەوە بوو، نەك هەر ئەم نەتەوە کۆنەیان لە مافی ڕەوای سەربەخۆ بوون بێ بەری کرد، بەڵکو لە نێوان پێنج قەوارەی دراوسێشدا دابەشیان کرد و گوێیان نەدایە نارەزایی و شۆڕشەکانی ئەم نەتەوە زوڵم لێکراوە.با دوو ماددەی (62،64)ی بەشی چوارەمی پەیمانی سیڤەری (10) ئابی (1920) پش دانی بە مافی ئۆتۆنۆمی یەکی نەتەوەی کورد دانابێ کە لەساڵێکدا بێ بەسەربەخۆیی تەواوی دەوڵەتێکی کوردی ئەوتۆ کە هەموو بەشەکانی کوردستان بەو کوردستانەی خوارووشەوە بگرێتەوە کە لەمەودوا و پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق بە کوردستانی عێراق ناسرا.بە مەرجێ دانیشتوانی بیانەوێت بچنە ناو ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەوە.

بەڵام ئەو ئاواتانەی لە پەیمانی لۆزاندا لە(24)ی حوزەیرانی 1923 دا، لەبار برا و ئەو بەشە لە (16)ی کانوونی یەکەمی 1925 ( کۆبوونەوەی 37) دا،خرایە سەر ویلایەتی موسڵی عێراق، هەرچەندە ئەو لیژنەیەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دروستی کردبوو لە لاپەڕە (57)ی ڕاپۆرتەکەی دا دانی بەوەدانابوو کە (ڕاستیی باری دانیشتوانی بەرەو دانان بە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردمان دەبات کە پێنج لە هەشتی (8/5) (دانیشتوانن). کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەوەندەی پێ بەس بوو کە کورد مافی بەشداربوونی کارگێری و دادوەری و دەستگاکانی زمانیان هەبێ.

بەم جۆرە سەرەڕای شۆڕشی کوردستانی خواروو بە سەرکردایەتی شێخ مەحموودی نەمر و دان پێدانانی بە حکومدار لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە یەکەم جار لە ساڵی 1919 دا و دووەمجار لە ساڵی 1922 دا، ئەم بەشەی کوردستان بەزۆرو بێ گوێدانە خواستی دانیشتوانی، خرایە سەر ئەو دەوڵەتە عێراقەی تازە دروست بوو.

حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا هەوڵی ئەوەی دا بە بەڵێنێك گەلی کورد دڵنیا بکا.ئەوە بوو لەگەڵ ئەو حکومەتەی عێراقدا-کە لەژێر ئینتدابی بەریتانیا دا بوو- پێکەوە لە دەربڕینی ڕەسمییاندا دانیان بەوەدانا کە ئەو کوردانەی لەسنوری عێراقدان مافی دروستکردنی حکومەتێکی کوردیان لە ناو ئەو سنورەدا هەیە . هەردوو حکومەت ئاواتیان ئەوەیە کەسانی کورد لە جیاوازی بپرن و لەسەر ئەو شێوەیەی ئەو حکومەتە و سنوری ڕێك بکەون و نوێنەری دەسەڵاتداری خۆیان بنێرنە بەغدا بۆ وتووێژ دەربارەی پێوەندی ئابووری و سیاسی لەگەڵ حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیا و حکومەتی عێراقدا. بەڵام ئەم پەیمانانە هەر بەنووسراوی مانەوە و نەهێنرانە دی .

کە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە 1932/10/3 دا عێراقی بە ئەندام وەرگرت، مەرجی ئەو ئەندامێتیە ڕازی بوونی عێراق بوو بەو مەرجانەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دایانبوون، ئەوەش ئەو مەرجە ناو دەوڵەتیانە بوون کە لە شازدە بڕگەی دەربڕینی (30) ی مایسی 1932 ی حکومەتی عێراقدا دەربڕدرابوون و لەو مەرجانە دا ڕێزگرتنی عێراقی لە مافی مرۆڤ و ڕۆشنبیری و کارگێری کورد و ئەو کەمە نەتەوانەی تێدا بوو کە لە لیواکانی: موسڵ و هەولێر و کەرکوکدا دەژین، ئەم دەربڕینە هێشتا کارگەرە چونکە هەموو ئەو ماف و ئەرکانەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ئەستۆی گرتبوون و لە پەیمان و ئینتداب دەربڕینەکان دروست بوون، بە پێی دوابڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە (18)ی نیسانی 1946 دا خراونەتە ئەستۆی ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان، ماددەی (16) ئەو دەربڕینەشی بە ئەرکی عێراق زانیوە کە ئەو بڕگانە بە جێ بێنێ و بە هیچ یاسایەکی ناوخۆ بە پێچەوانەی ئەوانەوە کارناکات و بە هیچ جۆر ئەو بڕگانە بە ڕێکەوتنی نێوان عێراق و ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان و بە زۆری دەنگ نەبێ نەگۆڕدرێ هەروەکو بڕیار لەسەر ناکۆکی ڕا لەبارەی لێکدانەوەی بڕگەکانی ئەو دەربڕینە درایە دەست دادگای هەمیشەیی دادی ناو دەوڵەتان.

بەم جۆرە سەربەخۆیی عێراق و یەکێتی زەویی ئەو بەستراون بە ڕێز گرتنی عێراق لە بڕگەکانی ئەم دەربڕینە . بەڵام حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆیان لە پەیوەندی و ئەرکانە لادا.

ئەم لادانەش لە بڕیاری ژمارە ( 688 ) ی 1991/4/5ی ئەنجوومەنی ئاسایشی ناو دەوڵەتاندا وە لە بڕیاری لیژنەی مافی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانا و ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە خولی ( 48 ) و بڕیاری ژمارە 1992 / 71 ی ( 5 ) ی ئازاری ساڵی 1992 دا سەلمێندراوە .

مێژووی گەلی کوردی ئێمە لە عێراقدا پڕە لە ڕاپەڕین و شۆڕشی، لە (11 ) ی ئەیلوولی 1961 دا، ئەم گەلە جارێکی تر بەرابەری سەرکردەی نەمر مستەفا بارزانی دەستی دایەوە چەك، چونکە حکومەتی عبدالکریم قاسم پەیمانی خۆی بەجێنەهێنا بوو و لە ماوەی سێ ئەمی دەستووری کاتیی پاش شۆڕشی ( 14 ) ی تەمموزی 1958 لایدابوو کە لەوێدا عەرەب و کورد بە هاوبەشی دانرابوون لە عێراقی نیشتماندا. ئەو شۆڕشە شۆڕشێکی نەتەوەیی بوو داخوازیی ئێمە و ئاواتی ڕەوای دەردەخست، ئەوەبوو ئاکامەکەی ڕێکەوتننامە مێژووییەکەی 11 / ئازار / 1970 و دانێك بە ئۆتۆنۆمی بوو بۆ گەلی کورد و چەسپاندنی لە دەستووریی کاتیدا، ئەگەر چی حکوومەتی عێراق دەقی بەیاننامەکەی وەها جێ بەجێ نەکرد کە لەگەڵ خواست و ئاواتی گەلەکەمان و جەوهەری ڕێکەوتننامەکەدا بگونجێ. ئینجا سەرەڕای نوشستیە کاتیەکەی ساڵی 1975 پاش پیلانێکی ناو دەوڵەتان کە ئەنجامی مۆرکردنی پەیمانی جەزائیر بوو و لەوێدا سەدام حسێن بەشێك لە خاکی عێراقی لە بری دامرکاندنەوەی شۆڕشی کورد فرۆشت، گەلی سەربەرزی ئێمە خێرا دەستی دایەوە شۆڕش وە لە خەباتی خوێنا بەردەوام بوو وە بۆ هەموو جیهانی سەلماند کە گەلێکی سەربەرزە و کۆڵ نادا.

پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەوەی جێگیر کردووە کە نابێ مرۆڤ لە مافە بنەڕەتیەکانی بێ بەری بێ و دانی بە سەرفرازیی هەموو تاقە کەسێك و بە مافی جوت یەکی پیاو و ژن و گەلانی گەورە و بچووکدا ناوە .

( سەرەتای پەیمانەکان – مەبەستەکان ) وەك لە بڕگەی ( 2 ) ی بەشی یەکەمدا نووسراوە دان بە ( دامەزراندنی پەیوەندیی دۆستانەی ناو نەتەوەکان لەسەر بنەڕەتی ڕێزگرتن لە ڕێبازی جوت یەکی گەلان لە مافی خۆیاندا، مافی چارەنووس بوونیان ) دانراوە. هەر وەك مافی چارەنووسی گەلان بە شێوەیەکی ئاشکرا لە بڕگەی یەکەمی دوو پەیماندانی ناو دەوڵەتی تایبەتی بە ( مافی ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ) و ( مافی مەدەنی و سیاسی ) دا دیارە.

ئەو دوو پەیماندانەی لە ئەنجوومەنی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ساڵی 1966 دا دراوە و عێراق دوایی لە 1971/1/25 جووە پاڵی و لەوێدا بە دڵنیایی دان بە ( مافی چارەنووسی هەموو گەلان و مافی جێگیر کردنی مەرکەزی سیاسی ) نراوە. هەر وەك ماددەی دووەمی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو ڕێ و شوێنەی دەست نیشان کردووە کە ئەم ئەنجوومەنە بۆ گەیشتنە مەبەست پەیڕەویان دەکا . ماف و ئیمتیازی ئەندامانی دەستگای نەتەوە یەگرتووەکانی بە ئاسایی بەستووە بە ( ڕێزگرتن لە سەروەری و یەکێتی زەوی – بەپێی پەیمانەکە بەستوێتی بە بەجێ هێنانی ئەرکی ئەندامان ) بە پێ ی ئەو پەیمانە.

خۆ ئەگەر بە ڕەفتاری حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بەرامبەر بە گەلی کورددا بچینەوە، هەر لە دامەزراندی دەوڵەتی عێراقەوە لە ساڵی 1921 دا هەتا ئێستاکە دەبینین دیارترین نیشانە بەو ڕەفتارەو، هەر داپڵۆسین و چەوساندنەوە و دەربەدەرکردن و بێ بەشکردن بووە لە ساکارترین مافی مرۆڤایەتی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەنانەت مافی زمانیش، جگە لە بێ بەش کردنی لە مافە سیاسیەکانیش. ئەمانەش هەموو بەشێوەیەکی وەها ڕێك و پێك کراون وە ڕوو لە پەرەسەندن بوون کە وێرانکاری سەر باری مرۆڤ، زەرعات و ماڵات و سروشت و ئاژەڵیشی گرتۆتەوە . ئینجا حکوومەتی عێراق چەپەڵترین شاڵاوی قەلاچۆ کردنی تاوتوێ کردە شای ڕەفتارەکانی کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژووی دێرینی، وێنەی بە خۆیەوە نەدیبوو لەوانە :

1.گرتنی زیاتر لە هەشت هەزار کەسی بێ گووناە لە بارزانیەکان لە شەوێکی ئەنگوستە چاووی ساڵی 1983 دا و کە هەتا ئێستا چارەنووسیان نەزانراوە.

2.دوورخستنەوی زیاتر لە ( 300 ) هەزار کوردی فەیلی بۆ دەرەوەی عێراق لە ماوەی 1970 – 1988 دا و گرتنی زیاتر لە ( 7500 ) لە لاوانیان و بیرای بێ شوێن وون کردنیان.

3. قەلاچۆکردنی زیاتر لە پێنج هەزار ژن و منداڵ و پیری بێ گووناه بە چەکی کیمای و گازی ژەهراوی لە شاری هەڵەبجەی شەهید دا لە ڕۆژی 16 /1988/3 . هەروەها کەسانێکی زۆری تر لە بالیسان و چەندین ناوچەی تری کوردستان.

4. شاڵاوێکی تری دڕندانەی ئەوتۆ کە لە گشت ژمارە باڵاکانی لە زۆر وچەور و جانەوەرێتیدا تێپەڕاند، لەوە دوا کە ناوبرا بە ئەنفالە بەدناوەکان و کە زیاتر لە سەد و هەشتا هەزار بێ گووناهی تێدابوونە قوربانی ئازاردان و برسێتی و هەتك کردن و زیندە بە چاڵکردنی بە کۆمەڵ.

5. خاپوورکردنی زیاتر لە ( 4500) گووند کە دەکەنە لە 90 % دێهاتی کوردستان . بەم جۆرە تەنانەت کەمایتیەکانیش لە تورکمان و ئاشوری و ئەوانی تر، بە دوور نەبوون لە داپڵۆسین و قەلاچۆکردن کە ئەمانە بە پێ ی بنامەکانی قانوونی نێودەوڵەتی، جەریمەی جەنگ و جەریمەی دژ بە مرۆڤایەتی .

بە هەر حاڵ حکوومەتەکانی جیهان کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەو جەریمە جەبەلاْنە بێدەنگ بوون، نەیانتووانی هاواری گەلەکانیان کپ بکەن و سۆز و جۆش و خرۆشیان قەدەغە بکەن کاتێ کە لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە بە سەرهاتی کۆرەوە بێ وێنەکەیان چ لە ژمارە و چ لە کارەساتە دڵتەزێنەکانیدا دەدی کە دوای نووچدانی ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی بەهاری 1991 ڕووی دا . بەم جۆرە جیهان بۆ یەکمجار دوای پەیمانی سیڤەرەوە، سەر لە نوێ ووشەیەکی دادپەروەرانەی دەرهەق بە کورد ووت، کاتێ بڕیاری ژمارە 688 لە ئەنجوومەنی ئاسایشەوە دەرچوو کە زۆر بە ڕوونی داپڵۆسینی کوردی گوناهبار کرد و ئینجا بە دوایدا، ناوچەیەکی پارێزراو لە بەشێکی کوردستانی عێراقدا دامەزرا و بەڵێن درا کە کوردی تێدا لە ڕووی دەستدرێژیەکانی ڕژێمی عێراقدا بپارێزێ.

گەلەکەمان سەرەرایی ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەو شاڵاوانەی بۆ لەناوبردنی دەکرانە سەری، هەردەم بە قبوڵکردنی هەر نیشانەیەك بۆ چارسەرکردنی کێشەکەی، دڵسۆزی و نیاز پاکیی خۆی نواندووە . لەوانە گفت و گۆی 1963 و بەیاننامەی 29/حوزیران/ 1966 و گفت و گۆی 1984 و چەندین تەقەلای تر بە ئامانجی گەیشتن بە چارسەرکردنی ئاشیانە لەگەڵ ڕژێمدا. بەڵام ئەم نیاز پاکییەی لە گشت حاڵەتێکدا هەر بە غەدر و ناپاکی و خۆ دزینەوە لەو ڕێکەوتنامانە بەرەنگاری کراوە کە لەلایەن ڕژێمە جۆراو جۆرەکانی عێراقەوە ئیمزا کراون. دوا تاقیکردنەوەش لەم بوارەدا گفت و گۆی ساڵی 1991 بوو کە ڕژێمی عێراق پاشە کشەی لە بەڵێنەکانی سەرەتای گفت و گۆکەی کرد و دواتر دایەرەکانی حکوومەتی کشاندەوە و ئابلووقەی ئابووری ی بەسەر کوردستاندا سەپاند کە گەلەکەمان ناچاربوو بە بڕیاری بەرەی کوردستانی و بەپێ ی دەسەڵاتی ( کاری کردە – الأمر الواقع – de facto ) لەو وەختەدا،پەنا بەرێتە بەر هەڵبژاردنێکی پەرلەمانیی سەربەست کە ئەوەبوو لە ڕۆژی 19 / 5/ 1992 دا بەشێوەیەکی زۆر جوان کراو گەلەکەمان لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستاندا، بەو پەڕی سەربەستیەوە نوێنەرانی خۆی بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان هەڵبژارد. ئینجا یەکەم حکوومەت بۆ هەرێمی کوردستان لە 1992/7/5 دا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ئیدارییە پێکهات و باوەری ئەو ئەنجوومەنەی وەرگرت.

یاسای ژمارە (1) ساڵی 1992 ( یاسای ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق ) لە بڕگە ( 2 ) ی مادده ( 56 )یدا سەبارەت بە ئەرکەکانی ئەنجوومەن دەڵێ : ( بڕیاردانی مەسەلە چارەنووسییەکانی گەلی کوردستانی عێراق و دەستنیشانکردنی پەیوەندی قانوونی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا ) . جا بۆ پاراستنی یەکێتی نیشتمانی عێراق و پتەوکردنی و بۆ پارێزگاریکردن لە برایەتی مێژووی نێوان هەردوو گەلی عەرەب و کوردی برا و بۆ مسۆگەرکردنی بەردەوامی و چەسپاندنی جێگای باڵای. هەروەها بە گوونجاوی لەگەڵ بڕیاری

ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لە ڤیێنا و لە کوردستان کە بە تێکڕایی ڕێکەوتن بنەمایی قانوونی مافی چارەی خۆ نووسین بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی هاوبەشی هەردوو گەلی کورد وعەرەبی برادا بسەلمێنن وە لەگەڵیدا مافی نەتەوەی ڕۆشنبیری و ئیداری بۆ تورکمان و ئاشووری دان پێدابنێن و لە تەکیاندا بە گشتی مسۆگەرکردنی یەکسانی لە ماف و لە ئەرکدا بۆ هەموان لە دەستوردا تۆمار بکەن . ئەوەتا ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق، بە ناوی گەلی کوردستانی عێراقەوە ئەرکی سەر شانی بەجێ دێنێ و بەپێ ی مافی چەسپاوی خۆی کە لەو پەیمان و باوەڕنامەی سەرەوەدا سەبارەت بە چارەی خۆ نووسین دیاری کراوە و نیشانەیان پێدان، ڕادەگەیەنێ کە بە تێکڕای دەنگ بڕیاری چاری خۆ نووسین وە دەستنیشانکردنی پەیوەندی قانونی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا لە پلەیەی مێژوودا، لەسەر بنچینەیی فیدراڵی لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی پەرلەمانیدا دەدا بە شێوەیەك کە سیستەمی فرە حزبی دابین بکا و ڕێز لە مافەکەی مرۆڤ بگرێ کە لە پەیمان و باوەڕنامە نێو دەوڵەتیکاندا سەلمێنراوەن.

**ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق**

**1992/10/4**

**هەولێر**

**هەلسەنگاندن و هەڵەی زانستی لەو بەیانە :** لەگەل گرنگی ئەوبەیانە بەلام هەلوەستەیەکیشی پێویستە،مادام ناومان ناوە مەوسوعە با بۆنەوەکانی داهاتوو هەندێ زانیاریان لە بارەی سادەیی و کەم زانیاری ونمونەی کەسی ناشایستە لە شوینی شایستە لە دیاری کردنی هەلە زانستی وسیاسی ویاسایی ئەو بەیانە بۆ دەرکەوێ .

دەقی بەیانەکە بەکوردی وعەرەبی وەرگیراوە لە (مجموعة القوانین والقرارات الصادرة عن المجلس الوطنی لکوردستان العراق –للفترة 1992/6/4 لغایة 1992/12/31) ج1، ط1 1997 ص269-272، ص238-241).

گرنگی ئەو بەیانەی سەروو باس کرا ، دەشبێتە دۆکیۆمینتەکی گرنگ ، کەچی پڕیەتی لە هەلەی زانستی وسیاسی ویاسایی ، هەوڵ دەدەین زۆر بەکورتی و خێرایی دەستنشانیان بکەین بە بەڵگەی ئەکادیمی ڕاستیان بکەینەوە، لە هەلسەنگاندنەکەش هەولدەدەین بەڵگەی سیاسی و یاسایی بەهێزتر لە مێژووی سیاسی کورد بخەینە ڕوو وەك بەدیل یان هاوتا بۆ داڕشتنەوەیەکی تری بەیانی وایان هەر بەیانیکی مافی چارەنوس، بەڵکو ببێتە دیکۆمێنتێکی زانستی و یاسایی و مێژوویی لەلایەك، لەلایەکی تریش پێناسی شەرعی و یاسایی مەینەتی کورد هەڵبگرێت.

زۆر بەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە :

1-بەیانەکە ئاماژەی بە مادەکانی سیڤەر (62، 64) کردوە دەلیٚ لە بەشی چوارەم کەچی بەشی سێیەمە. بەشی چوارەم ماددەکانی (65 هەتا 87) لەخۆ دەگرێت سەبارەت بە (سەمیرنا- ئەزمیری ئیستا) سنوری یۆنان وتورکیایە، ئینجا تەنها دوو مادده نیە، بەڵکو سیٚ ماددەیە: (62، 63، 64)[1317]. مادەی (63) زۆر گرنگە کە لە بەیانەکەدا بازی بەسەردا داوە، بریتیە لە دان پیاهێنانی حکومەتی عوسمانی بۆ جێبەجیٚ کردنی ماددەی(62)،.

2- دەلیٚ لە کۆتایی جەنگ کورد بێبەشکرا ،ڕاستیەکەی ئەوەیە لە ناوەڕاست و گەرمەی جەنگ بوو لە ڕێکەوتنی سایکس-بیکۆ- سازانۆف لە 1916/5/16 کوردستان بۆ یەکەم جار بە نەخشەو پلانی سیاسی دابەش کرا[1318].

3- لە ڕەوتی باسی دابەشکردنی کوردستان دەلیٚ کرایە __پێنج__ بەش، بەڵکو کرایە شەش بەش( یەکەم-ناوچەکانی دیالەو جەلەولا و دەورو بەر خرانە سەر ڕەنگی سوری* بەریتانی کە بریتی بوو لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە بۆ دروستکردنی عێراق.دوەم- کەرکوك و ناوچەکانی خوارووی هێڵی (36) خرایە سەر ناوچەی (B) بەریتانی.سییەم- ناوچەکانی هەولێر و ئاکریٚ و موسڵ و دهۆك خرانە سەر بەشی (A) فەڕەنسی.چارەم- ناوچەکانی کوردستانی رۆژئاواو شام خرانە سەر ناوچەی (زەرد)ی فەڕەنسی.پینجەم- بەشەکەی تری کوردستانی سەروو بۆ روسیا دیاری کرا.شەشەم- هەرچی کوردستانی رۆژهەلاٌتە هەر لەژێر دەستی ئێران مایەوەو بە دەر بوو لە ڕێکەوتنامەی سیڤەر).

4- باس لە بەلیننامەی ژ: 16 عیراق بۆ عوسبە دەکا کەچی ژمارەیان (10) تەعەهودە نەك (16) ، یان وورد تر بڵێین دوو بەندە یەکەمیان تایبەتە بە تەعەهودات پێك هاتوە لە 10 مادە، بەندی دوەمیش پێك هاتوە لە6مادە پەیوەندیدار نیە، لەدوای وردبونەوە لەو هەڵەیە دەرکەوت ئەوە(

---

[1317] بڕوانە دەقی ڕێکەوتنامەی سیفەرلە کتێبی : دەقەکانی کۆنگرەی سیڤەرو خوێندنەوەیەکی تـر- سـەلام نـاوخۆش و مسـعود عبدالخالق .

[1318] بڕوانە دەقی ڕێکەوتنامەی سایکس -پیکۆ لە پاشکۆی (**الإسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولـة العراقيـة الحديثـة** )– **الباحث**

* لە نەخشەی سایکس پیکۆ دا ناوچەکە بە پێی ڕەنگ وپیت دابەش کرا چونکە ئەوکاتی ئەو دەولەتانەی ئیستا نەبوون .

مادەی 16) بریتیە لە لائیحەی ئینتدابی عیراقی.

5-ئینجا ئەوتەعەهودانەش لە30/مایس/1932 نەنوسرایتەوە وەك لەبەیانەکەهاتوە، بەلکو لە 19/مایس/1932 بوە .

6- لەبارەی بنەما یاساییەکانی مافی چارەنووسی میللەتان کە لە (میثاق الأمم المتحدة- پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتوەکان) هاتووە، لە بەیانەکەدا دەڵێ: ((لە بڕگەی (2)ی بەشی یەکەمدا نوسراوە...))، کەچی راستیەکەی ئەوەیە لە پەرەگرافی (2)ی ماددەی (1)ە، ئینجا هەموو ئەوانە لە (بەشی یەکەمی- مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان) هاتووە[1319].

7-لە بەیانەکەدا پشتی بەستوە بە بڕیاڕی نەتەوە یەکگرتوەکانی سالی 1966، بۆ دیاری کردنی مافی چارەنوس و(دیاری کردنی مەرکەزی سیاسی )، ئەوەش هەڵەیە بڕیاڕی وا لە سالی 1966دەرنەچووە، بەڵکولە1960/12/14دەرچووە[1320]،

8- بە ئینگلیزی ناوی سیڤەری وا نوسیە ( SEVER)، ئەوەش هەلەیەکی باوی نێو کوردە کەلەبنەچەدا لە عربی وەرگرتوە بە هەلەیی، بەلاّم لە ئەسلی خۆی بەو شێوەیە :(SEVRES) .

9-دەلێ کوردستان بەسەر پێنج قەوارەی دراوسێدا دابەشکرا.. لەراستیدا ئەوە هەڵەیە بەڵکو راستیەکەی ئەو قەوارە سیاسیانەی وەك: عێراق، سوریا، تورکیا، ... بوونیان نەبوو.

10-لە بەیانەکەدا هاتووە گوایە پەیماننامەی سیڤەر هەموو کوردستانی یەکدەخستەوە، سیڤەر تایبەت بوو بە عوسمانی بۆیە کوردستانی ئیرانی نەدەگرتەوە

11-هەر لە بەیانەکەدا وا باسی ویلایەتی موسڵ دەکا کە عێراقی بووبێ و بەو شێوەیەیان نووسیوە: ((بەشی کوردستان... لە 16 ی کانوونی یەکەمی 1925، -کۆبونەوەی (37) خرایە سەر ویلایەتی موسڵی عێراق)). زانیارییەکە سەرتاسەری چەوتە، راستیەکەی ئەوەیە ویلایەتی موسڵ لەو بەروارەدا خرایە سەر عێراق نەك کوردستان خرابێتە سەر ویلایەتی موسڵی عێراقی، ئینجا ویلایەتی موسڵ سەر بەعێراق نەبووە، بڕوانە هەردوو نەخشەی عوسمانی 1893 و1896، هەروەها

---

[1319] بڕوانە دەقی (میثاق الأمم المتحدة ) .

[1320] بڕوانة: قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ..ص101، هەروەها بڕوانە دەقی ئەو بڕیارە لە پاشکۆی ژ:5 لەو نوسینە.

ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی کەبە ناوی (قاموس الاعلام) ناسراوە لە مادەی ویلایەتی موسل دەلیٚ ناو موسل عەرەبی تیٚدایەبەلاٚم ناوچەکەی کوردستانە، لەوەسفی موسل دەلیٚ ویلایەتی موسلی کوردستان[تریرسمتر].

---

[1321] بڕوانە مادەی 140لەو قاموسەدا .

(43)

## قەیرانی جیهانی سەرمایەداری   ازمة الرأسمالیة الکبری   Major crisis of capitalism

**ئەوانەش دەگریتەوە(هرم المقلوب، خولەکانی ئابوری ،بورجوازی ،پرۆلیتاریا ، لیبرالی ، زێدەبایی، پڵینگی کارتۆنی ...)**

سەرمایەداری وەك سیستەمەکانی تری بەشەری لەهەردوو ئاستی تیۆری و واقعی قەیرانی زۆری هەیە، بەلام ئەو قەیرانەی کە ناوی نراوە(قەیرانی جیهانی سەرمایەداری) تایبەت ترە ،بەشێك نیە لە قەیرانە کلاسیکیەکانی زێدەبایی وپرسی چینایەتی وبەهۆی جەنگ ورکابەری و ..نەبوو،بەلکو لەلایەکی ترو لەکاتێکا هات کە مەدرەسە ڕکابەرەکانی کەوتبوون بەتایبەتی شیوعیەت،دوای 37 سال لە کەوتنی شیوعیەتی سەربازگای بەرامبەرئەو قەیرانە دێت، ئەو قەیرانە لە سەرەتای 2008 دەستی پێکردو تا ئەو ساتەش بەردەوامە ، لەکاتیکا هات کە بانگیشەی کۆتایی میژوو لەسیستەمی سەرمایەداری دەکرا ،لە ناکاو قەیرانیکی گەورەی سەرمایەداری لە ناوجەرگەی چالاکی سەرمایەداری هات ،بوە هۆی نیمچە داڕووخانی بانك وتەواوی سیستەمی کاغەزی کەلە (سیتەمی عەقار) هات ،زیاتر پرۆسەکە بە(هرم المقلوب)ناوزەد کرا ، ئەو قەیرانە لە ئەنجامی پیشبینیەکانی مارکس لە (زیدەبایی) نەهات ،بەلکو نزیك تر بوو لە (ربا)ی ئاینی وتاڕادەیەکیش لە تیۆری (ریع)ی ریکاردۆ ، کەم تر مارکس پیشبینی بۆ چالاکی ئابووریانەی (ئال وگۆڕی دراو وقیمەی وەرەقی )کرد ، وەك رەخنەکەی لە بۆچوونی(مارسی دی لاریفر)گرتوە لەو بارەیەوە ، گرنگی پێداوە بەلام نەیزانی بەو قەبارەیە [1322]، لە ئەدەبیاتی مارکسی ئەو قەیرانانە مانای سەرەتای وەرچەرخانیەتی بۆ مردنی سەرمایەداری و شین بوونی سۆشیالیستی لە جێی ئەو وەك (لینین) ناوی لەدوا قۆناغی سەرمایەداری ناوە ترۆکی سەرمایە کە پڕە لە قەیران، پیناسی (قاموسی سۆڤیەتی)بۆ قەیرانی گشتی سەرمایەداری بریتی بوو لە داڕووخانی گشتی لە بوارەکانی ئابووری وسیاسی وئایدیۆلۆجیا[1323]، لەموسوعەی

---

[1322] کارل مارکس- رأسمال ج1ص204 انظر الحاشیة ایضا.

[1323] ماریۆف-القاموس السیاسي ص55

بریتانی کۆی رەخنەکانی سەرمایەداری بەوەی مارکسیشەوە لە (نا ئارامی دۆخی ئابووری )کۆکردۆتەوە ،هۆیەکەشی ئەوەیە تاکە مەبەست لە دینامیکیەتی سەرمایەداری قازانجە ،لەویش شلەژانی بازاڕی تێدەکەوێ ،ئیتر دلنیایی لەو سیستەمە بەدی ناکرێ وقەیرانی بەدوا دێت[1324]، قەیرانەکەش تەنها بۆ سەرمایەداران نیە هەمو لایەك دەگرێتەوە ،لەوەوە دەلێن خێری بۆ چینێکە بەلام زیانی بۆ هەموانە، لەوەوە زاراوەی (کۆسمۆپۆلیتی) هەندێ جار مانای نەرێنی وەردەگری وەك لە (قاموسی سۆڤیەتی)و(فەرهەنگی سیاسی ئارش) بەمانای هاوولاتی جیهانی دێت، دژی کەلتورو ناسنامەی دەڤەریە ،باوەڕی بەحکومەتی جیهانی وکەلتورو ناسنامەی جیهانیە بەو ڕووکارەی خزمەتی سەرمایەداری .

<u>**ناسینێکی سەرمایەداری**</u> : لەهەموان خراتر مارکس پیناسی ناشرینی سەرمایەداری کردوە لە کتیبەکەی بەناوی (سەرمایە) ، یەکەم جار ئادم سمیس لە کتیبی (ثروة الامم) (قیمة) و(کار)ی پێکەوە بەستەوەو داواشی کردوە پرۆسەی ئابووری لە دەستێوەردانی دەولەت دوور خرێتەوە ، ئینجا مارکسیش بەهەمان ئاڕستەو بەجۆریکی تر،کە تیایدا (قیمە- بایی)ی دزراو بنچینەی ئەو سیستەمە پێك دەهێنێت ،مارکس ماندوو بوونیکی زۆری بە پێناسی (قیمە) کردوەو بەستوویەتی بە کاری مرۆڤ (قیمە وکاری مرۆڤ)[1325]، سەرمایەداری لەلایەن زۆربەی زاناو ئابووریناس بەدەرد وەسف کراوە نەك چارەسەر دوورترین سیستەمی ئابووریە لەدادگەری،لەسەر ئەو بنچینەیەئابووری ئیسلامی بەتوندی ئابووری سەرمایەداری ڕەت دەکاتەوە[1326]، لە (مفاهیم حزب التحریر) هۆی پشیوی جیهان دەداتە پاڵ سەرمایەداری ،بە پیچەوانەی کۆتایی میژوو پێی وایە قەیرانەکانی چەندبارەو دەبێتەوە بە فراوانتر[1327]،بەهەمان وەسفی تیۆری مارکس(نظرية بؤس المتزايد)**وا وەسفی سەرمایەداری دەکا**

---

[1324] Encyclopædia Britannica Article:economic system

[1325] لەبارەی پەیوەندی قیمەو کار بڕوانە : کارل مارکس- راسمال(نقدالاقتصادالسیاسی) ص49

[1326] بۆ هەلویستی تێڕوانینی ئابووری ئیسلامی سەبارەت بە ئابووری سەرمایەداری بڕوانە : محمدباقر الصدر- اقصادنا .

[1327] **قاموس مفاهيم حزب التحرير- ص160**

،لەوانەش زیاتر کارل پولانی(1886-1964)لەکتیبەکەی (التحول الکبیر) سیستەمی لیبرالی ئابووری وفاشیەتی پێکەوە بەستۆتەوە .

زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن لەسەر پێناسی کە تیایدا توخمی مولکیەت وبازاڕی ئازادی وتاکگەرایی و قۆرخی ئامرازی بەرهەمهینان و کەڵەکەبوونی سەرمایە و کۆمپانیاکان لەدەست کەمایەتیەکی کارامە و هێزدار و..وکۆبوویتەوە ،وەك لە(الموسوعه العربیه العالمیه) کردوویەتی : (الرأسمالية هي النظام السياسي الاقتصادي القائم على الملكية الخاصة والربح الخاص. في هذا النظام، يمتلك الأفراد الشركات ويديرون أغلب المواردالمستخدمة في إنتاج السلع والخدمات)[1328]، بۆ ئەوەی سەرمایەداری بە ئازادی گەشە بکا پیویستی بە سیستەمیکی کۆمەلایەتی و یاسایی و فەرهەنگی تایبەتی هەیە ، سیستەم ودەسەلاتیکی تایبەتیش تیایدا (ئاین وئەخلاق ومافی مرۆڤ) وسیاسەت لیکجیا کرابیتەوە ،لەگەل ناوەڕۆکی زۆربەی ئاینەکان ناگونجیّ ، وەك لە تەورات واهاتوە:(الغني يزادهوالفقيريؤخذ -سفر الأمثال 28 ) (ثَرْوَةُ الْغَنِيِّ مَدِينَتُهُ الْحَصِينَةُ. هَلاَكُ الْمَسَاكِينِ فَقْرُهُمْ.

اَلْمُكْثِرُ مَالَهُ بِالرِّبَا وَالْمُرَابَحَةِ، فَلِمَنْ يَرْحَمُ الْفُقَرَاءَ يَجْمَعُهُ.

ئیمامی علی(فما اغتنى غني الا بفقر فقير) ،لە قورئانیش بە توندی وەسفی کردوە :(الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا)[1329].

لە ئینتیمای مەدرەسیش سەرمایەداری سەر بە مدرسەی لیبرالیزم (لیبرال دیمکراسی) یان بە واتایەکی تر سەرمایەداری دیوی سیستەمی ئابووری لیبرال دیموکراسییە، لە بنەچەدا (Liberaty) مانای ئازادیە، لە ئەفسانە کۆنەکان (لیبر)خوای ترێ و(ئازادی)ڕۆمەکان بوە ،هاوسەریشی (لیبرا) بوە [1330]، ئەو ڕێبازە لە شەبەنگێك تیۆر و فکر و ڕاڕەوی ئایدیۆلۆژیا و ئاینی و زانستی جیاجیا پێکهاتووە، مێژوویەکی تیۆری کۆنی هەیە (لەپێش زایین)، بەڵام پەیڕەو بوونی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری

---

[1328] الموسوعة العربية العالمية- المادة:رأسمالية

([1329]) سوره البقره: الآيه 275.

[1330] قاموس الخرافات ص198-

دەگەڕێتەوە بۆسەدەی16 زیاتر ،لەگەل شۆڕشی پیشەسازی وڕێنیسانس و ویستڤالیاو ... لێکنزیکن ،ئەگەر چی بەشێك میژووی سەرمایەداری بۆ کۆن تر دەگیڕنەوە ، بەشێك پییان وایە ڕێك بەرواری 1492ی دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکامیژووی سەرمایەداریە، هەرچی ئییڤ رۆنوار لە کتیبەکەی (رجال الاعمال الایطالیون فی القرون الوسطی) دەلێ سەرمایەداری لەسەدەی 12 ڕا دەست پێدەکات و یەکەم جار لە ئیتالیا بناغەکانی دامەزراوە نەك لە بریتانیا وەك باوە[1331]،بە پێی هەندی تویژینەوە لە ئیتالیاش کاریگەریەکانی بیری روشدی بوە کە بە (روشدی لاتینی-مەبەستی ئیبن روشدە)ناوی دەبرا ،دەشگۆترێ (پادوا)مەلبەندی سەرەکی بلاو بوونەوەی شارستانی روشدی بوە بۆ ئیتالیاو لەویش بۆ هەمو ئەوروپا[1332] ، هەرلەوەشەوە زاراوەی ئەرسنال وتەکنیك لە زاراوەی ئیسلامی (تقنی ودارسفن )وەرگیڕدراوە لە ڕێی ئیتالیاو ئیسپانیا ، لەلایەکی تریشەوە ئەو سەروەریە بۆ ئیتالیای دەگێڕنەوە مادام رینیسانس لە سەدەکانی 14 و15 و16 لەو وولاتە سەری هەلداوە[1333]،لە بیرمان نەچێت بەشێکی زۆریش بۆسەدەی 18ی دەگێڕیتەوە لەوبارەیەوە(گریگۆری کلارك)ڕێك بەرواری 1813ی کردۆتە خالی وەرچەرخان[1334]، هەندیکیش بۆ یەکەم هەنگاوەکانی شەپۆلی ئیستعماری دەگێڕنەوە ،لەوەش بەشێکی زۆر دەیگێڕنەوە بۆ ئیسپانیاو پورتغال کە بوونە میراتگری ئەندەلوس ،(د علی اکبر ولایەتی)وولاتی پرتغال بە یەکەم پیشڕەوانی ئیستعمار هەژمار دەکا،دەشلێ یەکەم شەپۆلی ئیستعماری لە سالی1500 هاتنەکلکیتیا بەلام لەوە سەرکەوتو نەبوون وهەمو مال وسامانیشیان لەسەر دانا ،دوای لە1603ز بەرەو کۆکین چوون وقەلایەکی گەورەشیان بۆ خۆ دروست کرد[1335]، هەرچی (ویل دیورانتە) بۆ بەریتانیای دەگێڕیتەوە ودەلێت سەرەتایەکی بانکی سووداری سەرمایەداری دەگەڕێتەوە بۆ پرۆسەیەك گوزارش لەوەرچەرخانی زراعی بۆ صناعی دەکا، پارەدارەکان خۆیان ڕێکخست لە کۆمپانیایەکی قەرز بە سوو بەناوی (کۆمپانیای بەنکی ئینگلتەرا) کەلە

---

[1331] جورج قرم-تاریخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص149

[1332] لەبارەی کاریگەری روشدی بروانە:د علیان جارودی- التحولات الفکریه فی العالم الاسلامی ص616-

[1333] بڕوانە : میژووی ئەوروپا لە سەردەمی رینیسانس تا شۆڕشی فرنسا ل9.

[1334] گریگۆری کلارك-الاقتصادالعالمی ص13

[1335] د علی اکبر ولایتی – موسوعه الاسلام والایران ص334

1694/4/27ز دامەزرابە فەرمی، پارەیان بەسووی ریژەی 4.5% وەردەگرت لەدەولەمەندەکان وبە ریژەی 8٪یان دەدایەوە حکومەت ،بەو جۆرە بەنکی بەریتانی دروست بوو تا لە سالی 1696ز پەرلەمان ئەو مافەی قەرزی تایبەت کرد بەوان [1336]...لەگەل زۆر ڕای ترهەیە .

بەگشتی ئەزمونی سەرمایەداری پیکهاتوە لەبەرهەم وئەزمونی هەموو ئەو زانا و فەیلەسوف و مەدرەسانە کە بەشدارن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕش بەسەر دەسەلاتی کەنیسە بەتایبەتی فکری (دیکارت) و (فرانسیس بیکۆن) و (ئەدمۆن بیرك ) و(ستیرات میل)و (مالتۆس) و(دیڤیدهیۆم)(ڕۆسۆ) تا دەگاتە دوورەکەیان لە سیاسەت کە (تیۆری پەرەسەندنە)، (ئادم سمیث) وریکاردو لە ئابووری، (دورکایم و کرۆتچە) لە کۆمەلایەتی و (سپینر) لە گەشەکردن (وجودیەکان) لەبارەی سەربەستیدا.. هەریەکەیان وەستای کارامەی ئەو مەدرەسەن ، تێکڕاییەك هەیە کە بەرژەوەندی وخۆویستی و (بنەمای هەرخۆم) ڕەوایی پێدراوە کەلەگەل بنەمای ئاینی نایەتەوە ،لەو بارەیەوە( ابن القيم )دەلێت: ( وليحذر كل الحذر من طغيان : أنا ، ولي ، عندي ، فإن هذه الألفاظ الثلاثة ابتلي بها إبليس ، وفرعون ، وقارون :
فأنا خير منه : لإبليس . ولي ملك مصر : فرعون . وإنما أُوتيته على علم عندي : لقارون[1337] .

هەرچەندە پێشتر سەرمایەداری وەك نەخۆشی و ئافات سەیر دەکرا، بەلام لەدوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی سۆشیالیستی، لە سەدەی نوێ سەرمایەداری جارێکی تر وەك ئایدیۆلۆژیا و عەقیدە هاتەوە مەیدان، دو کتێبەکەی –فۆکۆیاما-(کۆتایی مێژوو) و –سمۆئیل- (ململانێی شارستانیەکان) وایان وینەی چارەنوسی کۆمەلگە کردوە کە سیستەمی سەرمایەداری دوا نمونەی ژیانی شارستانیە، ئیتر تیۆری (سەرمایەداری خۆی خۆی نوێ دەکاتەوە)بەتوندی هاتە کایەوە ، دوای 30 سالیك لەو پاگندەیە ولە ئەستوری سەرمایەداری ئەو قەیرانە سەری هەلدا .

---

[1336] ويل ديورانت –قصة الحضارة ، ف10 ص10938(عصر لويس الرابع عشر – إنجلترا) .

[1337] ابن القيم – زاد المعاد في هدي خير العباد ج2 ص37 .

## قەيرانى جيهانى سەرمايەدارى

قەيرانە گشتيەكانى : لەسەرمايەداريدا بنەماى (بەرژەوەندى) لەسەر ئاستى تاك وكۆدا ڕەوايى وەردەگرێ دەبێتە بنچينەى سياسەت وياساو دەستور وماف وئەرك ،دەبتە سەرچاوەى هەموو دەردێكى، عەيارەكان تێك دەچن كۆمەڵگەيەكى دوور لەبەهاى مرۆڤايەتى و ئاينى دروست دەبێت،كۆمەلگەى سەرمايەدارى وكۆمەلگەى كشت وكالى لە پەيوەندى وهاريكارى وويژدان و..زۆر لێكجيان ، ياسايەك هەيە بەناوى( Univarsal social law)هاتووە (ژمارەى تاوان لە كۆمەڵگەيەك زياد دەكات ئەگەر ئاين رۆڵێكى پەراوێزى هەبێت)[تي سمسمتر]، لەسەرمايەداريدا هەژارى زۆر و دەوڵەمەندى زۆر دەوڵەمەند پەيدا دەكات ، ئەو چينايەتيە رەهەندى جيهانيش وەردەگرێ،لە ئامارى 1998ى نێونەتەوەيى دەركەوت دواى لە (كۆنگرەى زەمين)يش لە جوهانسبرك دووپات كرايەوە، (خەڵكى سەروو)* لە 20٪ى دانيشتوانى جيهان پێك دێنن كەچى لە 86٪ى داهاتەكان دەخۆن، (خەڵكى خوارووش) لە80٪ دانيشتوانن كەچى لە 14٪ دەخۆن، قەرزەكان بە قازانج جيهانى پۆلينى چينايەتى كردوە ،جيهانى يەكەم ودوەم و جيهانى سێيەم وچوارەم، لەوەوە (ڕۆجيە گارۆدى) ووتى بازاڕى ئازاد بريتيە لە ئازادى هەڵلووشينى هەژارەكان لەلايەن سەرمايەدارى[نى سمسمتر].

### سەربردەى قەيرانە ئابووريەكان

جاران قەيرانى ئابوورى زياتر لە نەهاتى و ووشكەسالى وكارەساتى سروشتى وجەنگى دەهات ،كەم تر وەك ئيستا لە ئەنجامى لەنگى سيستەم هاتوە ، لەسەردەمى كشت وكالى قەيرانەكان لەكەمى باران وكارەساتى كشت وكالى دەهات ،لە كوردستان ئەو قەيرانە ناوى (نهات) بوە ،ئەگەر زۆر سەختتر بوايە ناوى (گرانى) هەلگرتوە ، بەگشتيش لە جيهاندا هەورازو نشێوى ئابوورى لە هات ونەهات و قەيرانەكان پێى دەووترێ خولەكانى ئابورى ،زۆربەى جار بە ڕێك وپێكى نەبوە-واتە ديار

---

تي سمسمتر موسوعة العلم الاجتماع ص506. هةروةها بروانة: مةوسوعةى جودى ل255

*مەبەست لە خەلكى سەروو ئەمريكاو وولاتانى ئوروباى روزئاوا دەگريتەوە

[1339]روجيه گارودى- امريكا طليعة الأنهيار ص184 .

نەبوە کەی هاتەو کەی نەهاتە،جگە لە قەیرانە ئابوریەکەی سەردەمی یوسف پیغمبەر کە 7 سال هات و7یش نەهات، بۆیە چارەسەریەکی زانستی بۆدیاری نەدەکرا .

زۆر جار وادێتە پیش چاو کە قەیرانی ئابووری پەیوەندی دار بێت بە کفرو ئیمانەوە ، بودجەی سالانەی (ح سلیمان) 666کیش زێڕبوە کە هیچ پادشاییەکی ئەوسەردەمی خۆی لەقەرە نەدەدا [1340] ،لەکاتێکا نمونەی تری پیچەوانەش هەیە هەردوولا دووچاری بووینە ،لەسەردەمی (ح یەعقوب)و دوایش لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامیش قات وقڕی وقەیرانی ئابووری گەورە هاتۆتە پیش زۆربەی جار بە گوناح کردن وگوێڕایەل نەبوون بۆ فەرمانی خەلیفە لێکدەدرایەوە لەکاتێکا هۆیەکەی زیاتر یان سروشتی بوو یان نەزانی خەلیفە بوو ،لەوانە کاتێك موقتەدیر(لە سالی 907ز) بوە خەلیفە هەرزەکارێك بوو لەڕێی دەسەلاتی میراتی نزیکەی 15 ملیۆن دینار لەخەزینە بوو کەچی بەنەزانی(گوێی بەڕاوێژەکانی علی بن عیسای وەزیری نەدا) تەخشان وپەخشانی کردو بوە قەیران، یان جار وایە بەهۆی ناکۆکیە ناوەخۆییەکان لەوانە ناکۆکی نێوان ئەمین ومەئمون یان ململانێی تری سیاسی ومەزهەبی وتایفی تر ،برسیەتی وقەیرانی ئابووری گەورە ڕوویداوە هەندێکی باس دەکەین :

+لەسەردەمی عمر کوڕی خەتاب 639 ز ئەوەی پێی ووترا(عام المجاعە ) یان( عام الرمادە )

.

+سەردەمی خەلیفە ئەمین لەسالی 808 ز .

+لەسالی 822ز گەنم وئارد ئەوەندە گران بوو خەلکی لە برسامرد

+سەردەمی ئەمیر موفق باللە لەسالی 868 ز خەزینەش بە تالّ بوو دەولەت تووشی قەرزکردن بوو لە بازرگان ودەولەمەندان .

+ جارێکی تر لە سالی 869ز .

+لەسەردەمی خەلیفە (المعتچد باللە )لە نێوان(892-901)ز دیسان وولات تووشی قەرز بوو .

[1340]قصة الحضارة ص536 .

+لەسالی 993 ز جاریکی تر گرانی وقەیرانی ئابووری هاتەوە بەجۆریك هەژاران کۆبوونەوە ڕێیان نەدا نویژی هەینی لەمزگەوتان بکرێت .
+لەسالانی 1124 و 1161و1178 گرانی وقات وقڕی وقەیرانی ئابووری گەورە ڕوویدەدا ... زۆربەی جاریش چارەسەریەکان بەنەخشەو پلان نەبوە ،لەسەردەمی عەباسی لە قەیرانیکیدا هەلسان بە دروست کردنی پارەی ساختەو بوە قەیرانێکی گەورە [1341].

قەیرانی ئابووری لەسەرمایەداری وەك قۆناغی کشت وکالی نیە ،لەیەکەما زیاتر سەرچاوەی قەیرانەکان لە سروشت وهۆکارە دەرەکیەکان دێت وەك ووشکە سالی –لافاو –کلۆ-نەخۆشی-تالان –جەنگ...،هەرچی لەسەرمایەداریا زیاتر ناوەکیە ،بوار بە تویژینەوەو پیشبینی دەدا،بۆیە خولەکانی ئابووری (دورات اقتصادیە) وەك کشت وکالی نیە ، بە جۆری جیاجیا وهۆکاری جیا دەردەکەوێ ،هەندیکیان لە میژوو تۆماردەکەین :

(أولريش شيفر ) لە کتیبی (انهيار الرأسمالية -أسباب إخفاق اقتصاد السوق المحررة من القيود) هەندێ قەیرانی سەرەکی تۆمارکردوە ،لەوانە : قەیرانەکەی سالی 1825ی بریتانیا ودوایش 1836 دوای لە 1866ئینجا هەمو ئەوروپا:1882،1890 ،1907،1913...،لەسەر ئاستی جیهانیش قەیرانەکانی سەرمایەداری سالانی1929 -1933، 1974-1975 ،1981-1983، تەنها لەنێوان 1780 تا 1932قەیران زیادی کردو گەیشتە 14 قەیران یەك لەوەی پیشتر سەخت تر ،بریتی بوونلە(1787-1826،1788-1864،1857-1836،1873-1866-1882،1877-1884 1890-1900،1893-1907،1904-1920،1913-1929-1932،ئەوەی هەرەدوای لەهە موان کاریگەر تر بوو کە لە ئەمریکا سەری هەلدا،

[1341] بۆ هەمو ئەوانە بروانة ( تاريخ الأزمات الاقتصادية الإسلامية -الأسباب والمعالجات - العصر العباسي أنموذجاً - الدكتور أحمد إسماعيل عبدالله الجبوري)ئینجا ئەو سەرچاوانە (ابن الاثير، الكامل في التاريخ ج6ص384 ، ج11ص451) ( الطبري- تاريخ الرسل والملوك ج10ص67) (ابن خلدون- المقدمة، ص 179-181.

هەندێك بە هەژانی جیهانی وەسف دەکەن 31820 کۆمپانیا قەلۆش بون ،دوای ئەو قەیرانە گەورەکەی 1974 و 1975 دێت کە بوە هۆی هاتنی قۆناغێکی نوێی سەرمایەداری ، دوای ئەوە قەیرانەکانی 1980 دێت لە هەلاوسانی بەرهەم وکالا نەبوونی بازاڕی(کەسادی).

کـۆن تـرین قـەیرانی نزیـك لـەوەی ئیسـتا لـە سـالی 1266 ڕوویـدا کـاتێ بانکـەکانی بریتانیـا دووچـاری قەلۆشـی بـوون ، بـوە هـۆی قـەیرانی بیبازاڕیـەکی گـەورە ، ج پـۆلیتزر دەلێتیەکـەم قـەیرانی سـەرمایەداری گـەورە ی لەسـالی 1825 ڕوویـدا [1342] ، ئەنجلسـیش نزیکـە لـەوەو دەلێـت لـەزەق بوونـەوەی ململانێـی نێـوان پرۆلیتاریـاو برجـوازی ڕوویـدا کـاتێ میلەتان بەرەو مـافی چـارەنوس هـەنگاویان نـا [1343] ،لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمیش دیسـان لـە ئـەوروپا بـە هـۆی جـەنگی جیهـانی یەکـەم سـەری هەلدا،گـەوروترین قـەیرانی تـری سـالی 1929 زۆر بـاس دەکـرێ، قـەیرانیکی تـر لـە شەسـتەکانی سـەدەی بیسـت بـە هـۆی تـاخیر دانـەوەی قـەرزەکانی چـەند وولاتێـك (لـە پۆلنـدا) سـەری هەلـدا، سیسـتەمی سـەرمایەداری بەتایبـەتی بەشـی (هـرم المقلـوب) تـاخیر کردنـی قـەرز قـەیرانی ڕاسـتەوخۆی گشـتی پەیـدا دەکا،چـەند جـار ئـەو جـۆرە قەیرانـە دووبـارە بوویتـەوە ،بـە تایبـەتی ئـەوەی بەنکـەکان لەگـەل وولاتـانی جیهـانی سـێیەمیان کـرد ،یەکـەم جـار لـە مکسـیك دەسـتی پێکـردو قـەرزەکانی پێنـەدراوە ، قـەیرانی تـر لـە 1987 و1992و1997، 2000، ...بـەو شـێوەیە ووردە قەیران سـالانە هـەبوە ، تاگەیشـتە ئـەو قەیرانـە گـەورەی کەبابەتەکەمانـە بـەو شێوەیە دەسـتی پێکرد :

لە مانگی فیبرایەری 2007 دەست پێدەکات لە ئەمریکا ، کاتێ هەندێ لەوانەی سولفەی قەردیان کردبوو لەکاتی خۆی نەیان دەتوانی بیدەنەوە، بوەهۆی قەیرانی دارایی لەو بانکە خاوەن قەرزانە ،بۆ سالی 2008 ئەو قەیرانە گەیشتە بانکی ناوەندی ئەمریکی وناچاری کرد قازانجەکانی کەم بکاتەوە بە ڕێژەی3٪و نیو ،دەتوانین بلێین لەسەرەتای سالی 2008 ئابووری ئەمریکی دووچاری تەنگژیەکی

[1342] ج بولیتزر- اصول الفلسفة الماركسية ص270 .

[1343] انجلز- الاشتراكية الخيالية والاشتراكية العلمية ص56.

هات کاتێ بینرا میلی داوجۆنز679خال دابەزی ،میلی ستانداردبۆر 75خال ،نازداك 95خاڵ ..[ششسمتر]،ئیتر ئەوە دەستپێکێك بوو بۆ قەیرانەکان ، لە 17ی فبرایری 2008 گەیشتە بریتانیا، جارِی قەلۆشی دەدرا هەندیکیشیان بەهەرزان دەفرۆشران ،دوای ئەوانە ئەو دەردە زۆربەی بانکەکانی جیهانی گرتەوە ،لە 19ی سپتمبر سەرۆکی ئەمریکی(ج بۆش) بانگەوازیکی مەترسیدار بلاودەکاتەوە بۆ دەربازو 700ملیار لەلای حکومەتی ئەمریکی تەرخان کرا بۆ پالپشتی بەنکەکان ،دوای 4 رۆژ لەو بانگەوازە باسی ئەو قەیرانە گەیشتە نێو نەتەوە یەکگرتوەکان ،ئەوەش بە ڕوونی دەری دەخات کەسیستەمی سەرمایەداری سیستەمی جیهانیە بەهەمو دام ودەزگاکانەوە ،نەك دەولەت هەتا نەتەوە یەکگرتوەکانیش بێلایەن نیە ، تا ئەو ساتەش پرِوشکی ئەو قەیرانە لێرەو لەوێ دەتەقێتەوە ،بەلام ئەوجارەش تارِادەیەك ئەو قەیرانەیان ڕەت کرد ،بەلام بوویتە پرسێکی حەتمی کە بەجۆری تر دووبارە دەبێتەوە .

قەیرانەکە:

ئەو قەیرانە لە سەرەتای 2008 دەستی پێکردو تا ئەو ساتەش بەردەوامە ، ،پێشوو تر دوو ڕای پیچەوانەی یەکتر هەبوو ،لای مارکسیەکان ڕووخانی سەرمایەداری حەتمی بوو ، مارکس لە تیۆرەکەی(بۆس المتزاید)دەلێت لە چالاکی سەرمایەداری قەیرانەکە لەوە دێت چینی ناوەند نامێنێت تا هەژارو دەولەمەند لیکجیابکاتەوە ، بەلکو لەناو کۆمپانیاو کارگەکانیش وای لێدێت ئیش وکار تەنها لەدواقۆناغ دەکەوێتە دەست کۆمپانیا گەورەکان و چینی برجوازی مامناوەند بەرەو پرۆلیتاریا دیت ، لەسەر ئەو بنچینە مارکسیەکان پەنجاکانی سەدەی رابووردوویان بە قۆناغی کۆتایی وسێیەمی قەیران هەژمارکردبوو، لینین کتێبێکی بەناوی (الامبریالیە اعلی شکل الرأسمالیە)نوسیە تیایدا ئەوقۆناغەی بە کۆتایی هەژمارکردبوو کە نۆرەی سۆشیالیستی بێت، دوا مەولەت کۆتایی سەدەی بیستەم بوو ،لە کتێبی (فی الشیوعیە العلمیە)ئەو قۆناغەی بەکۆتایی هێنابوو پێی وابوو نیشانەکانی قۆناغی سێیەم نیشانەی کۆتای چینی برجوازو سیستەمی سەرمایەداریە ،ئەو حەتمیە

[1344] إبراهيم النجار-الأزمة المالية وإصلاح النظام المالي العالمي, الإسكندرية, الدار الجامعية, 2009م, ص 72 – 73.

تاریخیەی (مارکس وئەنجلس)پیشبینیان کردبوو خەریکی هاتنەدیە[1345]، بەگشتی شیوعیەکان سەرمایەداریان بە قۆناغێکی لەرزۆك وکاتی گوزارش دەکرد ، ماوتسی تۆنگ وەسفی سەرمایەداری بە (نمر من الورق- پلنگی کارتۆنی )کردوە، پیشبینی ئەوەیان کرد شۆڕشی پرۆلیتاریا لە وولاتانی پیشەسازی بکرێت ئەوە دەرنەچوو ،بەلام قەیرانەکانی ئەو جارە لەو وولاتانە دەستی پێکرد،دیسان هۆکارو دینامیکی وەك ئەوەی مارکسیەکان پیشبینیان کردبوو وادەرنەچوو ،ئەوان وایان زانی سیستەمی سەرمایەداری بە شۆڕشی کرێکاران(پرۆلیتاریا) لەناودەچیَ،دەستپێکەکەی لە ناکۆکی هێزەکانی بەرهەم هێنان لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان دێت، وەك یاسا هێزی بەرهەم هێنان گەشە دەکا، پەیوەندیەکانیشی رێگریەتی، تا دەگاتە رادەیەك ( ئەو خالە پێی دەووترێ critied) گەشەکە دەوەستێنیَ، بەو شێوەیە ئەو پەیوەندیەی بەرهەم هێنانی کلاسیکی بەناچاری دەتەقیَ و بەتوندی ژێرخانەکەی دەگۆڕیَ و دەبتە شۆڕشێکی کۆمەلأیەتی وسەرمایەداری دەڕووخیَ،باوەڕیان بە قەیران وچاکردنەوەی نەبوە ، کەمتر پیشبینیان لە مەیدانی عەقاری وبانك کرد لینین لەکتیبی (الامبریالیه اعلی مراحل الرأسمالیه)لە 10 بەش تەنها بەشی دوەمی لەو کتیبە بۆ پرسی بەنکی سەرمایەداری تەرخان کردبوو ، بەلام کە ئەو تیۆرەی مارکسی شکستی هێناو یەکیتی سۆڤیەت وسەربازگەی سۆشیالیستی ڕووخاڕایەکی توند تری پیچەوانەوا جاڕدرا گوایە سیستەمی سەرمایەداری دوا قۆناغی گەشەی کۆمەڵەو هەرگیز ڕووبەڕووی قەیران نابێتەوەو خۆی خۆی چاك دەکاتەوە ،بەپێی ئەوەی پێی دەوترێ(قانون سای) قەیران نامێنێت ،یاسایەکە بۆ بازاڕی ئازادو سەرمایەدارانە دەلیَ ئەوەندە کالاوبەرهەم بۆ بازاڕ بە پێی خواست قەیران ناهێلی[1346]،جاران زاناو مونەزیرانی سەرمایەداری وەلامێکی شەرمنانەی مارکسیەکانیان دەدایەوەو دەیان ووت سەرمایەداری دەردو قەیران نیە ، یەکەم جار (ماینادرکینز)لەسالی 1936 ەوە لەوەلامی (راسمال)ی مارکس ووتی ڕاستە رەوتی سەرمایەداری لە بەرزی ونزمی وچالاك وسستی پیك دێت ،لەدوای هەمو گەشەیەك وەستانی دێت بەلام ئەو پرۆسەیە هەتاهەتایەو بەدیلی نیە [1347]،_ئەو تێڕوانینە زیاتر پتەو بوو لە دوای

---

[1345] افاناسیف- فی الشیوعیة العلمیة ص97-

[1346] معجم مصطلحات عصر العولمة ص354

[1347] Encyclopædia Britannica Article:economic system

شکستی شیوعیەت لە کۆتایی سەدەی ڕابوردو،هەریەکە لە هنتکتۆنو فۆکۆیاما و گراهام فولەر وکۆمەلێکی تر وەسفی پیرۆزی سیستەمی سەرمایەداری بکەن پێیان وابوو سەرمایەداری ئۆتۆماتیکییانە چاکسازی خۆی دەکا،خۆی ئۆتۆماتیکیانە نوێدەکاتەوە ،کۆن نابێت ،کۆتایی مێژووی کۆمەلگەیە، دەیانگوت دەولەت لەپشت سەرمایەداری نییە، دوای ئەو تیۆرە پەڕەگرە وادەرنەچوو، ڕووبەڕووی قەیرانێکی سەخت بۆوە، ئەو دەولەتانەی ڕۆژئاوا لەخزمەت ئەو سیستەمەن و بینرا بۆ دەرچوون لەو قەیرانە تەواوی بوودجەی ولاتییان خرایەژێر دەست، بەلام هەر چاك نەبوو زیانی قورسی وەشاند.

سەرەتاکەی لە بەشی (عەقارو بانکەکان )دەستی پێکرد وهەموولایەکی گرتەوە بەشێکی تر دەلێن سەرەتاکەی لە 2007 دەست پێدەکا ،لەلای کۆمپانیا ئەنتەرنیتیەکان و ئەو ئاماژانەی (نازداك) ،دوای لە 2008 بە ڕوونی سەری هەلدا ، کورتیەکەی ئەوەیە:

لە راستیدا سیستەمی سەرمایەداری دەرمان و چارەسەری کێشە ئابوورییەکان نییە وەك وا باوە ئێستا،لەو دەمە سەرکەوتووترینیانە بەلام دادگەری نیە، هەریەکە لە ریکاردۆ و ئادەم سیمس و مارکس و ئەنجلس و لینین.....زۆری تر بە وردی نەخۆشی و قەیرانە گشتییەکانی سەرمایەداران دۆزیوەتەوە، بە تایبەتی (زێیدەبایی، سوود، فرۆشتنەوەی قەرز، پەیوەندی نەبوونی کار و بەرهەم، ...هتد)، ئەوەی بوێری بە پسپۆرەکانی رۆژئاوا بدا و بلێن سیستەمی سەرمایەداری سیستەمی عەولەمییە و سەرمەشقە ئەوشکستی ئەزموونی شیوعیەتی رۆژهەلاتی بوو لەبەرامبەر سەرکەوتنی سەرمایەداری رۆژئاوایی بوو ، کەچی ئەو جارە لەو قەیرانەدا دووبارە دەرکەوتەوە شیفاکەی لە چوارچێوەی سەرمایەداری نەبوو، یەکەم هەلسانەوە لە ئاسیا بوو، ئێستاش ئەو گەشە ئابوورییەی لە چین و کۆرییا و مالیزیا و ئێران و ....هتد دەبینرێ کە سیستەمێکی ناسەرمایەدارییە بەلگەیەکی ترە کە سەرمایەداری حەتمی مێژوویی نییە،بەلکو سیستەمی سەرمایەداری لەسەر لوغمە وەك پرۆتۆکۆلی (5)ی حوکەمای سەهیۆنی هاتووە و راستیش دەکەن، سەرمایەداری هاوچەرخ سیستەمێکی پەڕەگر و توندە، ئەگەر چی سەرمایەداری کلاسیکی (5) خەسلەتی هەبوو وەك لینین دیاری کردبوو ، ، ئەوەی ئیستا دوو خەسلەتی بنچینەیی هەیە:

1-بەشە هەرە زۆری وەهمیە.

2-لە سەرخانەوە بۆ سەرخانە.

قەیرانەکەش لە نێو ئەو دوو خەسڵەتە سەری هەڵدا، سەرمایەداری هاوچەرخ زیاتر سەرمایەداری چەك و دراوی پێدەوترێ لە چوارچێوەی سیستەمی بانکەکان، ئابوری سەرمایەداری لە ئابووریەکی واقعیانە وەرچەرخاون بۆ ئابووریەکی خەیالی پشت بەستو بە دراوی کاغەزی،ئەو دراو وسەنەدانەش ڕاستەوخۆ وەك جاران نوێنەرایەتی ئابووری سەر زەوی ناکا، معامەلە بەو چەکانە دەکرێ بێ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ئابوویە راستەقینەکەی، یاخود هەرسەودا و پرۆسەیەك کە قازانج دەکرێ ئەگەر لە ریی (بەرهەمهێن-ژێرخان) نەبوو ئەوا قازانجێکی درۆزنانەیە، چونکە هەر لە چوارچێوەی دراوو چەکەوەیە، ئەگەر بە وردتر و لە بناغەڕا پێدا بچین روونتر دەبێتەوە، گریمان یەکەم دراو یان چەك پاڵپشتی کردەسەر خاڵێك لە ئابووری راستەقینە لەسەر زەمین، ئەوا کڕیاری دووەمی ئەو چەکە بە قازانجێك پانتاییەکی فراوانتر دەکا.

ئەو چەك و سەنەداتە چەند جارێکی تر دەفرۆشرێتەوە بە قازانج و بەرە بەرە تا سەر دەکەوێ پانتاییەکی فراوان داگیر دەکا و لە سەرزەمنیش یەك خاڵە، تا وەك قووچەکێکی وەرگەڕاوی لێ دێت ، ئەو پرۆسەیە پێی دەوترێ (نظرية هرم المقلوب)، ، کاتێ خانوەك دەفرۆشرێ بە نرخێکی ڕاستەوخۆ بە پێی نووسین وشایەد مەعمەلەیەکی تەواوە لە ئابووری ئیسلام ،بەڵام ئەو سەنەدەی نێوانیان وەردەچەرخێ بۆ دراو دەفرۆشێتەوە بە نرخێکی گران تر ئەویش دەیداتە یەکێکی تر بەگرانتر وبە زنجیرە دەڕوا بێ ئەوەی معاملەکە پالپشت بکاتە سەر خانوە ئەسلیەکە ،زیاتر ڕێبازی قەرزی بە سوو وەردەگرێ ،واتە قەرزیش جارێکی تر دەفرۆشرێتەوە، لە ڕێبازی ئابووری ئیسلام دەردەچێ ،تەنانەت لە ریبازی ئابووری سۆشیالیستیش دەردەچێ ، واتە لەسەرو یان بەبەپێی دراو و چەك و سەنەدات خەڵکێکی زۆر ساماندارە کەچی لە ئابووری راستەقینە و ژێرخاندا وا نییە، کەی ئەوە ئاشکرا دەبێ کاتێ متمانە نەمێنێ یان دەوڵەت رووبەڕووی کارەساتێك یان قەیرانێك دەبێتەوە، ئەوا ئەو متمانە وەهمییەی دروست بووە وەك پوولی دۆمینە یەکە بەیەکە دەگەڕێتەوە سەر خاڵەکەی سەرەتایی ،دەردەکەوێ بە هەزاران کەس خاوەنی ئەو خاڵەیە بێ ئەوەی کەس ئاگای لە کەس بێت.

ئەو قووچەکە (هەرەمەکە)تادەڕوا سەری گەورە دەبی ٘و بنکەشی هەر خالەکەی سەرەتاییەو کە بە پێچەوانەی قووچەکی ئاسایی زۆر نا ئارام دەبێ وئامادەیە بۆ وەرگەڕان ،لێرەوە زەمینەی قەیران ئامادەیە، لەوێ دەولەمەندی وەهمی گەلێ زۆر دەبێ لە دراوو سەنەد زۆری هەیە ،هەر لەوێش بە ئاسانی لەلایەن دەسەلات وکۆمپانیا گەورەکان بچوکەکان هەلدەمژرێن لەرێی زیاد لە چاپ دانی دراو سەنەدات و چەك.

ئابووری کاغەز سەدان جار لە ئابووری راستەقینە زیاتر هەیە، بە پێی ئامارێك هەرچی لەسەر زەوییە و ناوی (ئابووری نرخدارە) و پێنج هەسارەی تری وەك زەمینی بۆ قەرز بکەی ئینجا دەکاتە بارتەقای ئابووری کاغەزی درا و سەنەدات و چەك، ئەو ئابوورییە کاغەزییە بە سانایی لێشی دەدزرێ نەك بە دزیکردنی ئاسایی، بەلکو لە رێی چاپکردنی چەك و سەنەدات و دراو هەروەك ئێستا لە دابەزینی نرخی ئەوانە لەلایەن هەمووکەس هەستی پێ دەکرێ، هەر لەبنچینەشدا بەهۆی ئەو دزییە وای لێهاتووە ئابووری کاغەزی سەدان هەزار جار بە ئەندازەی ئابووری راستەقینە بێت بە جۆرێك لە جۆرەکان هەندێ کۆمپانیای وا ترسناك هاتۆتە کوردستان لە جەوهەردا ئەو کارە چەپەلە دەکاو پارە لەخەلك وەردەگرێ، دەتوانین بلێین تێکڕایی هەلاوسان لە سیستەمی ئابووری سەرمایەداری لەسەدا چەندین هەزارە، هەموو ئەوانە لەکاتی قەیران ئاشکرا دەبێت و بە زەحمەت چاك دەبێتەوە، پرۆسەی کاری سەرمایەداری بانکی زۆربەی جار تەنها لە چوارچێوەی ئەو دراوەیە بێ ئەوەی بێتە سەر ئەرزی واقیع وبەرهەمێکی نوێ بێننە کایەوە کە ئەوە ئەسلی پەیامی مرۆڤە، هەلبەتە کێشەی هەرە مەزنی ئەو سیستەمە ئەوەی دووبارە (وسیط) قازانج دەکا بێ ئەوەی کاری ماسولکەیی یان زیهنی بخاتە سەر، چونکە لە بنچینەدا پەیامی مرۆڤ (تەعمیری زەوییە) واتە بەرپاکردنی شارستانی لەسەر ئەو بنچینەیە ئەو جۆرە چالاکییەی سەرمایەداری لە چوارچێوەی ئابووری سۆسیالیستی و ئابووری ئیسلامی حەرامە، لە ئابووری ئیسلامی سەنەد، یان هەر مالێکی قەرز یان راستەقینە نەبێ کڕین و فرۆشتنی پێ ناکرێ، ئەوەی زۆر زیانی بەردەکەوێ لەو سیستەمە ئەو ولات و کۆمپانییایانەیە کە خاوەنی ئابوورییەکی راستەقینەو خۆی بە نەزانی تێکەلی ئەوانە دەکا، لە کوردستان ئابووری راستەقینە زیاترە لە ئابووری کاغەزی، نەوت و سامانی تری ژێر زەوی،

کۆمپانییاکانی سەرمایەداری جیهانی نایەت لە ڕێی ئابووری کاغەزی کوردستانی سەودا لەگەڵ کوردستان بکا بەڵکو لە ڕێی دراوی خۆی کە بە شێکە لەو ئابوورییە وەهمییەی باسمان کرد.

کاریگەری بەسەر کوردستان

بە ماوەیەکی کەم لەپێش ئەوقەیرانە گەورەیەی ڕووبەڕووی سیستەمی سەرمایەدار بۆوە چەند شارەزا و پسپۆڕێکی ئابووری کوردستانیش هەمان گوتەکانی هنتکتۆنو فۆکۆیاما و گراهام فولەر بیان دەگوتەوە، گوایە سەرمایەداری ئۆتۆماتیکییانە چاکسازی خۆی دەکا،ئیتر بەیەکجاری کوردستانیان لە بازاڕێك ئالاند بەناوی بازاڕی ئازاد ..ئابووری کوردستان وێرانتر بوو ، سەرەڕای ئەوەش دەرکەوت سەرمایەداری ئەو وەسفانە هەلناگرێ ،زیاتر لە وەسفی لینین نزیکە کەدەلێت سەرمایەداری بۆگەنە ،بینیشمان لەسەروو چ سیستەمێکە ،سیستەمی وولاتانی وەك کوردستان هەر نیە ، بۆیە زۆر دوور بوو لە کوردستان بەلام لەبەر نەبوونی پلان ودیاری کردنی سیستەمێکی ئابووری گونجاو ئەو کاریگەرییانەی بەسەر ئابووری کوردستانیەوە دەبێت، چونکە بڕیار بەدەستانی ئابووری کوردستان بێ ئەوەی حیساب بۆ قۆناغی سیاسی کوردستان و کاریگەری جیۆپۆلۆتیك و قۆناغی پێکەیشتنی کۆمەڵگە و ئاستی سیستەمی ئابوورییەکەی بکەن، یەکسەر بڕیارییان داوە سەرمایەدار دروست بکە، ئەوەش لە چوارچێوەی ئەو (تقزم الثقافي)یەی دووچاری زۆربەی رۆشنبیر سیاسەتمەداری کورد بووە، وا دەزانێ هەرچی لە رۆژئاوا هەیە بیهێنێتە کوردستان پێشکەوتنە.

کت و مت وەك قۆناغی (1850 تا 1920)ی عوسمانییەوە بەهۆییەوە تێچوون، ئەو کاتیش هەرچی لە ئەورووپا دەهات و دوو کتێبی ڤۆڵتێر و مۆنتسیکۆ و رۆسۆی بۆ باس دەکردن دەیان وت ئەوە چارەسەری پێیە با بیکەینە وەزیر و سەدرلئەعزەم و راوێژکار، بۆ ئەوەی کوردستانیش زیاتر لەو قوراوە نقوم نەبێت تەقەڵایەك دەدەین شتێك لەو ئەزمونە هەڵەیەی کوردستان باس بکەین و بزانین پەیوەندی بە قەیرانە بنچینەییەکانی سەرمایەداری چییە.

سیستەمی ئابووری کوردستان:

زۆر زەحمەتە ناسنامەیەکی ئابووری دیاریکراوی بدەینە پاڵ سیستەمی ئابووری کوردستان، چونکە نەخشە و پلان و مەنهەجی ئابووری لەسەر هەرسێ ئاستی کشتوکاڵی و بازرگانی و پیشەسازی نابینرێ، بە کورتی ئەوەیە نەوت دەفرۆشرێ و بەشی کوردستان بەخواردن دەدرێ و تەواو، 20 ساڵە باس لە ئەزموونی نوێی کشتوکاڵی و ئەندازەی جینی و گەشەی پیشەسازی و دروستبوونی سەرمایەداری لە کوردستان دەکرێ کەچی سەرەنجامەکەی ئێستای ئەوەیە:

1-لە مێژووی کوردستان ئاوا کشتوکاڵ وێران نەبووە هەتا لەو فەترەییەی 1985-1988 کە کوردستان وێران دەکرا، لە مێژوودا لەلایەن گەڕیدە و ئەنسکلۆپیدیەکان باسی هەر شار و گوندێکی کوردستان کرابێ ئەوا باسی بەربوومی کراوە، بازرگانی شام و کەنداو جزیرە هاتوون لە کوردستان دانەوێڵە و بەرهەمییان کڕیوە، کەچی ئێستا لە ژێر سایەی حکومەتی کوردستان دەبێ هەمووی لە دەرەوە بێت، یەکێ لە فاکتەرەکانی (بەرگری لە کوردستان) ئەو بەرووبوومە خۆماڵییە بوو کە ئابلوقە نەیتوانییوە چۆك بە شۆڕش بدات، بەڵام ئەو جارە خوانەخواستە بایی ئابلوقەی 24 سەعات ناکەین.

2-لە مێژووی کوردستان بازرگانی ئاوا مەترسیدار نەبووە، بە تایبەتی ئەو چینەی پێی دەوترێ (کۆمپرادۆر) ئەوانەن کە بازرگانی دەرەوە دەکەن، ماناکەشی بازرگانی نیشتمانی، لە راستیدا ئەوانە بازرگانن بەڵام (نانیشتیمانین)، دژن بەو وڵات و میللەتی خۆیانن، دەگەڕێن هەر لە دەرمان تا دوا کەل وپەلی بە سەرچوو و خراپ بۆ کوردستان دەهێنن، بێ ئەوەی سزایەك هەبێت، بە سەدان خەڵکی کوردستان بەهۆییەوە دووچاری سەرەتان و شەکرە و نەخۆشی دڵ و ....هتد دەبێت، رۆژانە بەتەن خۆاردن و دەرمانی بەسەرچوو دەسووتێنرێ بێ ئەوەی لەو بازرگانانە بپێچرێتەوە، ئەو بازرگانانە ( کە عادەتەن لەگەڵ بەرپرسێکی گەورە شەریکن) بونەتە نموونەی شاز لە جیهان، یەکێك لە بازرگانانی خەڵکی چین وتبووی حەز دەکەم کوردستان ببینم بزانم بۆچی بازرگان و بەرپرسەکانی

ئەوانە دوژمنی ئەو وڵاتەی خۆیانن! لە هەر وڵاتێك كە بازرگانێك داوای كەل و پەلی خراپ دەكەن پێیان دەڵێن تۆ كوردی؟ ئەو بەشە  بازرگانەی كە نیشتمان پەروەر و بەویژدانن بوارییان پیّ نادریّ كار بكەن.

3-لە رووی پیشەسازی و تەكنەلۆجیياوە، لە كۆنەوە لە كوردستان گەشەی تەكنەلۆژی هەبووە، تۆپ و تفەنگ و ماكينەی ئاوی و هەوای لیّ دروست كراوە، لە دواييش چەندين كارگەی گەورەی قوماش و چيمەنتۆی و كارگەی تر بۆ حكومەتی  هەرێم مابۆوە، بەڵام لە جياتی قوماش كرا بە كارگەی (بيبسی —تايبەت) ... بە كورتی  هەرچی ناوی ژێرخانی ئابوورييە نەماوە، ئەوەی لە كوردستان دەبينریّ و سەرەنجامی ئەو نەخشە و پلانانە هەڵەيە بريتييە لە :

1-زاڵبوونی بەرژەوەندی تايبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتی بە ميللەت و ئاسايشی  نەتەوەیی و چارەنووسيشەوە.

2-بەكارهێنانی دەسەڵات و حكومەت بۆ زاڵبوونی كەرتی تايبەت بەسەر كەرتی گشتی.

3-ئينقلابێكی  ترسناكی قازانج لەلايەن (وسيط)ەوە دژ بە بەرهەمهێنەر كرا، بەوپێی بەرهەمهێنەر ساڵێك خەريكی  بەرهەم دەبیّ بازرگانێك يان بەقاڵێك (وسيط) دێت بە چەند دەقيقەيەك لێی دەكریّ لەو بەرهەمهێنەرە زياتر قازانج دەكا،  هەڵبەتە لە هيچ وڵاتێك بوار نادریّ بەرهەمهێنەر وا بچەوسێتەوە، چونكە بەرهەم و داهێنان دەوەستیّ هەروەك لە كوردستان وەستاوە.

4-جگە لە تاوانی هێنانی كەل و پەلی بەسەرچوو ئەوەی دەهێنریّ لە كوردستان بەبیّ رێنمايیو پابەندی نەخشە و پلانە،  پەيوەندی بە (سياسەتی ئابووری) كوردستان نييە، بۆ نموونە هێنانی سپليت بوەتە هۆی پەكخستنی كارەبا، هەورەها هێنانی ئەو ئۆتۆمۆبيلە بوەتە هۆی گرانی و تێكدانی ژينگە و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.

5-ئەگەر پێدا بچين بە هەمان شێوە دەبينين كەرتەكانی تەندروستی  وپەروەردە....تا دەگاتە

وەبەرهێنان و دروستبوونی سەرمایەداری...وێرانە.

6-گرانی و قورخکردنی ئابووری لەلایەن دەسەڵاتی باجەوە.

بەو زەمینەی سیستەمی ئابووری کوردستان هەرهەنگاویکی بازرگانی وخۆبەستنەوە بەبازاڕی جیهانی وێران کردنی ئابووری کوردستانە .

هەموو ئەوانەی سەروەش راستەوخۆ لە خزمەتی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری وبەرگری کوردستانیشە، لەگەڵ زۆر سەرەنجامی تر بوار نییە لێرە لەو دەرفەتە تەسکە باسی بکەین.

خۆڕزگارکردن لە کاریگەریەکانی : هەندێ هەنگاوی سەرەتایی هەیە وەك داڕشتنەوەی سیستەمێکی ئابووری گونجاو لەگەل قۆناغی ئێستای کوردستان ،لەوانە:

1-وەزارەتی پلاندانان کارا بکرێو پلانی ستراتیجیی ئابووریو کۆمەڵایەتی دابنێ بە تەواوی پاڵپشتی دەسەڵاتی سیاسیو دارایی حکومەتەوە.

2-بەرپرسی حزب و وەزیر دووركەونەوە لە کەرتە ئابورییەکان، یان وەك لەدەستوری ئیمارات مادەی (62) جەخت لەو خالە دەکاتەوە ( لا يجوز لرئيس مجلس الوزراء أو نائبه أو لأي وزير اتحادي ، أثناء توليه منصبه ، أن يزاول أي عمل مهني أو تجاري أو مالي ، أو أن يدخل في معاملة تجارية مع حكومة الاتحاد أو حكومات الإمارات ، أو أن يجمع بين منصبه والعضوية في مجلس إدارة شركة تجارية أو مالية.)[14].

3-دەسەڵاتی ئابووری لەدەست (وسيط) دەربهێنرێ بگەرێتەوە بۆ بەرهەمهێنەر بەتایبەتی ئەوانەی بە ماسولکەو زەین کار دەکەن.

---

[14]دستور امارات مكون من (152 ماده و 10باب).

4-کشتوکاڵ و گوندەکان بکرێنە بنەمایەکی سەرەکی بەرهەمهێنان، ئەو نەخشەیەیە گوایە دروستکردنی سەرمایەداری کوردستانی لەهەموو لایەك وێران کردووە، ناکرێ بە گەندەڵی (سەرمایەدار) دروست بکرێ، بەڵکو لە ڕێی بەرهەم و داهێنان دەبێ سەرمایەدار دروست بکرێ.

5-دووبارە یاسای (الارض لمن یزرعها) پیادە بکرێ نەك مەلاك دروست بکرێ، دەبێ وابکری ئەوەی لە گوند دادەنیشێ قازانجی زیاتر بێت، بۆ ئەوەی گوندەکان ئاوەدان ببێتەوە، ، ئەوانەی زەوی و زاری گوندەکانیان لەدەستە 75٪ی لەشارن، پێویستە زەوی بدرێتە ئەوانەی دانیشتووی گوندن لەگەڵ یارمەتی و ئاسانکاری و ئیمتیاز بۆیان، ئەو پلانەی ئێستای تاپۆکردنی زەوی کشتوکاڵی بەسەر مەلاك ترسناکترین پلانە.

6-دەبێ بزانین پێویستە سسیستەمی ئابووریمان(هەروەها باقی سیستەمەکانی تری سیاسی و یاسایی و فەرهەنگی و راگەیاندنیش) پێویستە هەماهەنگ بێت لەگەڵ سیستەمی رزگاری نیشتمانی (کوردایەتی)، ئەوەش وا فەرز دەکا کە گوندەکان چەقی قورسایی بن، یەکێ لە نەخشە و پلانە ترسناکەکانی داگیرکەر ئەوەبوو کۆمەڵگەی کوردەواری لە بەرهەمهێنەوە بکاتە بەکاربەر، لە گوندەوە وەری چەرخێنەتە شار، چونکە ئەگەر 60٪ی دانیشتووان گوندی نەبوو ئەوا نە شۆڕش و نە بەرگری کوردایەتیش دەکرێ، نە گەشەکەش واقیعی دەبێ، کەچی ئێستا بە پێچەوانەوە 25٪ی دانیشتوانی کوردستان لەگوند ماوە و 75٪ بووەتە شاری بە هەموو سروشتە فەرهەنگی و دەروونی و سیاسی و ئابوورییە سەقەتەکانییەوە. ئەوەش سەرچاوەی زۆربەی قەیرانەکانی هەریمی کوردستانە ،نەك هەر ئابووری بەلکو سیاسیو ئیداری ویاسایی وژینگەیی وزۆری تر .

7-زۆر بە خێرایی دوورکەوینەوە لە لاسایی کردنەوەی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری، ئەوە لە ئاستی ئێمە نییە، کەی ئێمە مونافەسەی کۆمپانییا گەورەکانمان پێ دەکرێ، هەر ئەوان لە خۆڕا ئابووری ئێمە هەڵدەلوشن، ئێمەی هەژاری بن دەست، ئێمەی داگیرکراو، بێ تەکنەلۆجی! نەفام لەو سەردەمە، ...بچین لاسایی ئەوانە بکەینەوەو کۆنتاکتی بەهەلەیان لەگەل بکەین ماڵمان وێران

دەبێ هەروەك وێران بووە، با واز لەو كۆنگرانەی كۆمپانییا و وەبەرهێنان و گرێبەستی هەڵەی نەوتی و ..واز بێنین، بە لایەنی كەمەوە بەو بێ بەرنامەییە واز بێنین، ئەگەر بە بەرنامە و نەخشە و پلانێكی زانستی و ورد و قووڵ و هەمەلایەن بۆ ئەو مەسەلانە بچین دەشێ، بەڵام لە هەموو بوارێكدا ئێمە و بازاڕی ئازاد و سیستەمی ئابووری سەرمایەداری و دروستكردنی سەرمایەدار یان نەفامییە یان گەندەڵییە.

بەو شێوەیە خۆ تێكەڵ كردن بە نەزانی وەك ئەوە وایە راستەوخۆ تەزووی كارەبای زەخت عالی بهێنیتە ماڵەكەت و هەموو دام و دەزگاكانت بسووتێ، پێویستە ئابووری كوردستان لەگەڵ ئابووری راستەقینە سەودا بكا خۆی دوور بخاتەوە لە سیستەمی بانقی هاچەرخ تا دەكرێ، دەبێ ئەوەش بزانین لە سیستەمی سەرمایەداری هاوچەرخ رەگەزی ئەخلاقی تیا نییە، تا بڵێین ئەوا ئێمە ئەو هەموو قازانجەمان كردووە بە ئەمەك و بەڵێنمان هەبێ بۆ رۆژەكی رەش كە رووبەڕووی میللەتی كورد دەبێتەوە، بەڵكو یەكسەر جارێكی تر لەگەڵ ئەو داگیركەرەی كلیلەكانی ئەو ئابوورییەی لەدەستە سەودا دەكەنەوە.

باشترین رێكەی ئابووری كوردستان كاركردنە بەپلاندانانی ستراتیجی بۆ هەموو كەرتو سێكتەرە ئابوورییەكانو سودبینینەوە لە رێگەی ئابووری ئێرانی و توركی نوێ و مالیزی و ئاسیاوییەكان، هەرچەندە كوردستان نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی زۆر پێویستی بەو رێگە چارەیەش هەبێ.

(44)

**ڕێکەوتنی سایکس پیکۆ** **اتفاقیە سایکس بیکو** Sykes-Picot Agreement

**ئەوانەش دەگریتەوە ((مسألە الشرقیە، پیاوە نەخۆشەکە، ڕێکەوتنی (ماکماهۆن —شریف)، بەلینی بەلفۆر، لیژنەی (کنگ —کراین)، (سیاسە باب المفتوح)...**

ئەوچەمکە لێکدراوە مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆسەرەتای سەدەی بیستەم کەچی بە چەمك وزاراوەیەکی سەردەم هەژماردەکرێ ،چونکە تا ئەو ساتەش کاریگەری هەرە بنچینەیی لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست  بە کێشەکانی کورد وفلستینیشەوە ماوە، ڕێکەوتنێکی نهێنیە لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918)لە نێوان بەریتانیا وفرنساو روسیا مۆرکرا،دوای روسیا لێی کشایەوە تەنها بریتانیاو فرنسا مانەوە ،  ناوەکەش(سایکس- پیکۆ) کورتکراوەی هەردووکەسایەتی دیپلۆماسی گەورەی وەزارەتی دەرەوەیان هاتوە (مارك سایکس)ی بەریتانی و (جۆج بیکۆ)ی فرنسی و (سازانۆف)ی رووسی  مۆرکراوە لە1916/5/16 .

لەدوای لاوازبوونی دەولەتی عوسمانی وبەهێزبوونی وولاتانی ئەوروپی بیرۆکەی دابەشی رۆژهەلاتی ناوەڕاست هاتەکایەوە ،زنجیرەیەك ریکەوتن وکۆبوونەوەی نهێنی کرا ،لەهەمویان گرنگ تر ریکەوتنامەی سایکس پیکۆ بوو ، ئەو کاتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەو دەولەتانەی ئیستای نەبوو بەلکو دابەشیەکی ئیداری ولایاتی عوسمانی بوو بە دێزاینی ولایەتەکان ،بۆیە دابەشیەکە بەناوی وولات ورەگەز ونەتەوەو مەزهەب نەبوو بەلکو بەڕەنگ وپیت بوو ،ئەو سنورانەی عوسمانیشی تێکدا کە بۆویلایات ومتەسەرفیەو سنجاقەکان دروستی کردبوو لە چوارچێوەی ئیدارەی عوسمانی .

ئەو ڕێکەوتنامەیە بە نهێنی بوو تا لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ڕوسی 1917 ئاشکرا کرا،دوای لە ریکەوتنامەی سیڤەری1920 بەشە هەرە گرنگەکانی جیبەجێ کرا ،تا ئیستا زۆربەی کیشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەدەست ئەو دابەشیە دەنالێ ،هەندێ ڕای میلی زۆر باو هەیە گوایە دوای هەر

100 سالیك ریكەوتنە نیودەولەتیەكان هەلدەسەنگێنرینەوە بۆیە لە سالی 2016 سایكس پیكۆش دەستكاری دەكرێت ..ئەوە هیچ بنەمایەكی ئەكادیمی نیە .

## بارودۆخی سەرهەلدانی سایكس پیكۆ

جاران لەلایەن رۆژئاوا بە مەترسی ودۆسیەی عوسمانیان دەووت (مسألە الشرقیە) ،ئەو دۆسیەیە زیاتر رۆژهەلاتی ناوەڕاستی دەگرتەوە ، كە ناوچەیەكی فراوان وگرنگەلەسەر ئاستی میژوویی وواقعی وجیۆپۆلیتیكی ،بۆیە لەگەل لاوازبوونی دەولەتی عوسمانی چاو لەو ناوچەیە برا،یەكەم جار قەیسەری رووسی (نیكۆلای) ناوی لە بارودۆخی عوسمانی نا پیاوە نەخۆشەكە، ئیتر تەقەلای دابەشی دەست پیدەكات ، (دین كروسیە) لەكتیبی (وجە اسیا) دەلیت: ئەو تەقەلایانەی دابەشی عوسمانی و رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەرێكەوتنی(كارلو فیجە 1699م )دەستی پێكردكەلەو رێكەوتنە بوو كە عوسمانی دۆڕابوو سەرەتای لەدەستدانی ویلایەتەكانی رۆمیلی(ئەوروپی) بوو ،لۆرانس لە كتیبی (أعمدە الحكمە السبعە ـ seven pillars of wisdom) دەلیَ لە سەدەی 18 ەوە خەریكی نەخشەی دابەشی رۆژهەلاتی ناوەراستین،چڕ تر لە كۆنگرەكانی بەرلینی 1884 دەست پی دەكا كە ئەفریقای پیَ دابەش كرا،دوای كۆنگرەی پاریسی(4-9)/2/ 1902كۆنگرەی پاریسی 1907 ئینجا پاریسی دوەم 18-23 یونیو 1913، ئینجا كۆبونەوەگەورە هاوبەشەكەی (روسیا وبریتانیا ، فرنسا، بلجیكا، هولندا، برتغال،ئیتالیا، ئیسبانیا) بڕیاڕیان دا رۆژهەلاتی ناوەڕاست وئەفریقا لیك جیا كەنەوە[1349]، سەرجەم گەیشتە نزیكەی 100 كۆنگرە ،بۆ ئەو مەبەستە كۆمیتەیەكی پسپۆریشیان تەرخان كرد و لەویَ بڕیارِی لیّك جیاكردنەوەی ئەفریقاو ئاسیا درا بە هۆی دروست كردنی دەولەتی ئیسسرائیل و هەندیَ دەولەتی عربی تر[1350]، لەو میانەدا جەنگی جیهانی یەكەم هەلگیرسا، بریتانیاو فرنسا سەركردایەتی هاوپەیمانانیان دەكردو ئەلمانیاش وولاتانی تەوەر،دوای 3 مانگ لەو جەنگە عوسمانیش هاتە ناویَ لەدژی بریتانیاوفرنسا،ئیتردابەشی عوسمانی ورۆژهەلاتی ناوەڕاست كەوتە قۆناغیّكی ڕاستەوخۆ،جاریكی تر لە1915/3/18 فرنساو بریتانیا ڕێكەوتنیّكی تریان

---

[1349] عبدالرزاق حسنی-تاریخ الوزارات العراقیة ج 2 ص249 .

[1350]الثورة وقضایا العربیة ...ص28.

لەبارەی دابەشینەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست کردەوە، لە هەمان سال ریکەوتنی قوستەنتینیەوریکەوتنی لەندەن کران[1351]،ئینجا ریکەوتنی روسی وفرنسی 1915 و پەیماننامەی(سازانوف — بالبوخ) لە 1916/4/26 ، نامە گۆرینەوەکانی نیوان (ئەدوار گرای — وەزیری دەرەوەی بەریتانی لە1916/5/15 )و بالویزی فرنسا لە لەندەن سەبارەت بە دروست کردنی حکومەتە عەرەبیەکان ودیزاینی نویی رۆژهەلاتی ناوەراست[1352]،ژمارەی نامە گۆڕینەوەکان گەیشتە11جار[1353]، تا لە16 /1916/5 ریکەوتنامەی سایکس پیکۆ مۆرکرا[1354] .

لەبارەی هۆی نهینیەکەی ئەوە نیە وەك لە زۆربەی توێژینەوە عەرەبیەکان دەڵێن لەبەر ئەوەی ڕێکەوتنی لەگەل عەرەب هەبوە کە بە ڕێکەوتنی (ماکماهۆن —شریف) ناوزەد کراوە،وانیە ،چونکە ئەوەی ئەو ڕێکەوتنەی ئاشکرا کرد ڕووسیا بوو ،ئەوانیش بە ڕێکەوت لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 ناو وەزارەتی دەرەوەیان پشکنی کۆپیەکیان لەو ڕێکەوتنە دۆزیەوە ،یەکسەر بە دوای نوێنەری عەرەبیان نارد وپشانیان دان ،کەچی عەرەب هەلویستی نەبوو ..ڕاستیەکەی نهێنیەکەی ئەوە بوو زیاتر تا هاوپەیمانەکانی بریتانیا وفرنسا (لەوانە ئەمریکا) نەزانن چ ڕوودەدا ،بۆیەش دەبینین ئەمریکا زۆر لایەنگری ئەو هەنگاوانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست نەبوو لەو دابەشیەو دوایش لە سیستەمی ئینتداب و زۆر لای تر ،لیژنەی (کنگ —کراین)ی ناردە رۆژهەلاتی ناوەڕاست وپرۆژەی ئەمریکایان داڕشت بە ناوی (سیاسە باب المفتوح) بە جیا لە سایکس پیکۆ،ئەو 12 مادەیەی ودرۆ ویلسن دیسان تێڕوانینێکی جیای ئەمریکایە لە(سایکس پیکۆ)کەلە 1918 جاڕیدا، مادەی دوازدەهەمی جاڕنامەکە هاتووە: دەبێ بواری تەواو بەو میللەتانە بدرێ کە ئێستا لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی دان، بۆ ئەوەی بە مافی چارەنوسیان بگەن.

---

[1351] العراق والحركة الكمالية 1919 _1923، قاسم عاص الجميلىص12 .

[1352] فورستر-نشأة العراق الحديث ص80،هةروةها (ديباجةى رِيَكةوتنامةكةش بخويَنةوة) .

[1353] الموسوعه السياسيه- ...: ( اتفاقيه سايكس- بيكو)، ص22.

[1354] لە موسوعەی بریتانی (Encyclopædia Britannica ) 9ی مانگی دیاری کردوە نەك 16ی مانگ .

ناوەڕۆکی سایکس پیکۆ : پێکهاتوە لە12 مادەوهەندێ ملحق ونەخشەیەك ،مادەکانی بە شێوەی پیت ورەنگ بەرجەستە کرابوو لەسەر نەخشەکە، پیت (A, B )و رەنگی( شین و سورو قاوەیی وسەوز) بەشێوەیەکی سەرەکی ڕەنگی شین و پیتی Aبۆفرنسا ، نیلیەکە دوەلی فلستینی دەگرتەوە ،سورو پیتی B بۆ بریتانیا ، لە نەخشەکە بەشی رووسیاو ئیتالیاش دیاری کرابوو ،بەشیوەیەکی گشتی شام ولبنان بۆ فرنساو عیراق وئوردەن وفلستین وولاتانی کەنداو کەوتنە لای بریتانی ،لای سەرووش تورکیاو کوردستان بۆ روسیاو ئیتالیا ،ئەو کاتی ئەمریکا لە گۆڕەپان بەهێز نەبوو پشکی بۆ دیاری نەکرا،بەدرەنگەوە سەرووی کوردستانی بۆ دیاری کراو ئەویش ڕازی نەبوو ،لەنەخشەکەی سایکس پیکۆ(ئەگەر بە پێی ناوهێنانی وولاتانی ئیستا)ئەوا ناوچەیەك بە ڕەنگی شین دیارکراوە، ئەو ناوچەیە بۆ فەرەنسابوو، بریتی بوون لە هەرێمەکانی رۆژئاوای سوریاو لوبنان و کیلیکا و عینتاب و ئۆرفە و ماردین و دیاربەکر و هەکاری، ناوچەی سۆر بۆ ئینگلیزبوو، ویلایەتی بەسرا و بەغدا هەروەها هەردوو بەندەری حەیفا و عەکاشی دەگرتەوە، هەرچی بەشی روسیای قەیسەری بوو ئەو ناوچەیە ڕەنگی قاوەیی کرابوو، بەشێکی زۆری باکوری کوردستانیشی دەگرتەوە.. هەروەها لە رێکەوتننامەکە ناوچەیەکی بچووك بۆ ئیتالیا دانراوەو رەنگی سەوز کراوە. ناوچەی ئیزمیڕ، تەدالیا، قۆنیە، ئایدن، سیرنا دەگرتەوە.

ئینگلیز و فەرەنسا دوو هێزی باڵادەست بوون ئیمتیازی زیاتریان بەخۆدا، هەندێ ناوچەیان بە (A) دیاری کرد بۆ فەرەنسا پێکهاتبوو لە بەشی رۆژهەڵاتی سوریا و سەرووی مسیۆپۆتامیا-ویلایەتی موسڵ، ناوچەی (B) بۆ بریتانیا بریتی بوو لە ئوردن و ناوەڕاستی عێراق- ویلایەتی بەغدا.

روسیا لە جەنگی جیهانی یەکەم هاوپەیمانی ئینگلیز و فەرەنسا بوو، ڕازی نەبوو بەوەی لە رێککەوتننامەکەدا هاتبوو، دەوڵەتێکی ئەوروپی بەهێز وەك فەرەنسا لەسەر سنوری بێ بە پاڵپشتی ئینگلیز، ،ئەو ناوچانەی دەکەونە سەر سنوری روسیا-ئێران بەرەو باشوری هێڵی غازی عەنتاب، ئۆرفا، ماردین، ئۆرمێ بدرێتە فەرەنسا،روسەکان توانیان ئەو ناوچانە لە فەرەنسا بستێنن و لە بەرامبەر روسیاش دەستبەرداری ناوچەکانی سێواس و خەربوت و باکور و رۆژهەڵاتی کوردستانیان پێدا،کوردستانی باشوریش(کەدەکاتە ویلایەتی موسڵ) لە رێکەوتننامەکەدا وەبەر فەرەنسا کەوتبوو.

هەرچی مادەکانی سایکس پیکۆشە بەکورتی بەو شێوەیە بوو:

مادەی یەکی  دروست کردنی دەولەتی عیراق وسوریا و پاراستنی ،مادەی (2) دیاری کردنی پشکی فرنساو بریتانیا ،مادەی(3) سەبارەت بە چارەنوسی فلستین ،مادەی (4) و(5) بەشی بریتانیا، مادەی (6) دیاری کردنی  جیکەوتی سکەی شەمەندەفەر و لە مادەی (7 ) مافی بریتانیا لە ناوچەکانی فلستین وئوردەن ، مادەی (8) لەبارەی گومرگە ، مادەی (9) دیاری کردنی بەشی فرنسا ،مادەی 10)  پاراستنی وولاتانی کەنداو تەنها بۆ بریتانیاو فرنسا بمینیت، مادەی (11) دیاری کردنی سنوری وولاتانی تازە دروست کراوی عەرەبە ،مادەی(12) لە بارەی سیاسەتی چەك وپیدانی بەو وولاتانەیە . ئەوەی خوارەوەش  دەقی ریکەوتنامەی سایکس پیکۆیە  بە عربی :

المادة الأولى: إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض المحلية، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.

المادة الثانية: يباح لفرنسا في المنطقة الزرقاء (سوريا الساحلية) ولإنكلترا في المنطقة الحمراء (منطقة البصرة) إنشاء ما ترغبان به من شكل الحكم مباشرة أو بالواسطة أو من المراقبة، بعد الاتفاق مع الحكومة أو حلف الحكومات العربية.

المادة الثالثة: تنشأ إدارة دولية في المنطقة السمراء (فلسطين)، يعين شكلها بعد استشارة روسيا وبالاتفاق مع بقية الحلفاء وممثلي شريف مكة.

المادة الرابعة: تنال إنكلترا ما يلي: 1- ميناءي حيفا وعكا. 2- يضمن مقدار محدود من مياه دجلة والفرات في المنطقة (آ) للمنطقة (ب)، وتتعهد حكومة جلالة الملك من جهتها بألا تتخلى في أي مفاوضات ما مع دولة أخرى للتنازل عن جزيرة قبرص إلا بعد موافقة الحكومة الفرنسية مقدماً.

المادة الخامسة: تكون اسكندرونة ميناء حراً لتجارة الإمبراطورية البريطانية، ولا تنشأ معاملات مختلفة في رسوم الميناء، ولا تفرض تسهيلات خاصة للملاحة والبضائع البريطانية. وتباح حرية النقل

للبضائع الإنكليزية عن طريق اسكندرونة وسكة الحديد في المنطقة الزرقاء، سواء كانت واردة إلى المنطقة الحمراء أو إلى المنطقتين (آ) و(ب) أو صادرة منهما. ولا تنشأ معاملات مختلفة مباشرة أو غير مباشرة على أي من سكك الحديد أو في أي ميناء من موانئ المناطق المذكورة تمس البضائع والبواخر البريطانية. تكون حيفا ميناء حراً لتجارة فرنسا ومستعمراتها والبلاد الواقعة تحت حمايتها، ولا يقع اختلاف في المعاملات ولا يرفض إعطاء تسهيلات للملاحة والبضائع الفرنسية، ويكون نقل البضائع حراً بطريق حيفا وعلى سكة الحديد الإنكليزية في المنطقة السمراء (فلسطين)، سواء كانت البضائع صادرة من المنطقة الزرقاء أو الحمراء، أو من المنطقتين (آ) و(ب) أو واردة إليها. ولا يجري أدنى اختلاف في المعاملة بطريق مباشر أو غير مباشر يمس البضائع أو البواخر الفرنسية في أي سكة من سكك الحديد ولا في ميناء من الموانئ المذكورة.

المادة السادسة: لا تمد سكة حديد بغداد في المنطقة (آ) إلى ما بعد الموصل جنوباً، ولا إلى المنطقة (ب) إلى ما بعد سامراء شمالاً، إلى أن يتم إنشاء خط حديدي يصل بغداد بحلب ماراً بوادي الفرات، ويكون ذلك بمساعدة الحكومتين.

المادة السابعة: يحق لبريطانيا العظمى أن تنشئ وتدير وتكون المالكة الوحيد لخط حديدي يصل حيفا بالمنطقة (ب)، ويكون لها ما عدا ذلك حق دائم بنقل الجنود في أي وقت كان على طول هذا الخط. ويجب أن يكون معلوماً لدى الحكومتين أن هذا الخط يجب أن يسهل اتصال حيفا ببغداد، وأنه إذا حالت دون إنشاء خط الاتصال في المنطقة السمراء مصاعب فنية أو نفقات وافرة لإدارته تجعل إنشاءه متعذراً، فإن الحكومة الفرنسية تسمح بمروره في طريق بربورة- أم قيس- ملقا- إيدار- غسطا- مغاير إلى أن يصل إلى المنطقة (ب).

المادة الثامنة: تبقى تعريفة الجمارك التركية نافذة عشرين سنة في جميع جهات المنطقتين الزرقاء والحمراء في المنطقتين (آ) و(ب)، فلا تضاف أية علاوة على الرسوم، ولا تبدل قاعدة التثمين في الرسوم بقاعدة أخذ العين، إلا أن يكون باتفاق بين الحكومتين. ولا تنشأ جمارك داخلية بين أي منطقة وأخرى في المناطق المذكورة أعلاه، وما يفرض من رسوم جمركية على البضائع المرسلة يدفع في الميناء ويعطى لإدارة المنطقة المرسلة إليها البضائع.

المادة التاسعة: من المتفق عليه أن الحكومة الفرنسية لا تجري مفاوضة في أي وقت للتنازل عن حقوقها، ولا تعطي ما لها من الحقوق في المنطقة الزرقاء لدولة أخرى سوى للدولة أو لحلف الدول العربية، بدون أن توافق على ذلك مقدماً حكومة جلالة الملك التي تتعهد بمثل ذلك للحكومة الفرنسية في المنطقة الحمراء.

المادة العاشرة: تتفق الحكومتان الإنكليزية والفرنسية، بصفتهما حاميتين للدولة العربية، على أن لا تمتلكا ولا تسمحا لدولة ثالثة أن تمتلك أقطاراً في شبه جزيرة العرب، أو تنشئ قاعدة بحرية على ساحل البحر المتوسط الشرقي، على أن هذا لا يمنع تصحيحاً في حدود عدن قد يصبح ضرورياً بسبب عداء الترك الأخير.

المادة الحادية عشرة: تستمر المفاوضات مع العرب باسم الحكومتين بالطرق السابقة نفسها لتعيين حدود الدولة أو حلف الدول العربية.

المادة الثانية عشرة: من المتفق عليه ما عدا ذكره أن تنظر الحكومتان في الوسائل اللازمة لمراقبة جلب السلاح إلى البلاد العربية.

## كوردستان وعیراق له سایكس پیكۆدا:

لەو دابەشیە ناوی هیچ وولاتێك نەهاتوە بۆیەش بە ڕەنگ وپیت دابەش كران ،عیراق وسوریاو ئوردەن و...نەبوون ئەو ناوانەش باو نەبوو، تەنها سنوری ویلایەتەكانی عوسمانی هەبوو كەسەردەمێك ژمارەیان گەیشتە 32 ویلایەت ، بۆیە ناوچەكەیان لەسەر بنچینەی ڕەنگ وپیت دیاری كرد، بە شیوەیەك (a و سور) بۆ بەریتانیا بوو ،عیراق وئوردەنی دەگرتەوە،( b و شین)بۆ فرنسا بوولای شام،(ناوچەی بۆر-فلستین)خرا سەر نیو دەولەتی ،سەرووی كوردستان وئەرزەرۆم بۆ رووسیا دیاری كرا، هەندی ناوچەی سەرووش بۆ ئیتالیا دیاری كرا .

كوردستانیش وەك وولاتانی عربی دابەش كرا بێئەوەی چارەنوسی دیاری بكرێت، ،جگە لەكوردستانی خۆرهەلات كە ریكەوتنامەكە لای ئیرانی نەدەگرتەوە تەنها میراتی عوسمانی دەگرتەوە،

کوردستان کرا پینج پارچە ، بەهەمان شێوە لەسەرەتاو لەڕیکەوتنی سایکس پیکۆ ناوی عیراق نەهاتوە .

ڕەوشەنبیرێکی زۆر بەهەلە وادەزانن لەمادەی 1 و2 ناوی سوریاو عیراق هاتوە ،لە عربیەکە واتەرجمە کراوە- **المادة الأولى**: إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض المحلية، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.

ئەگەر بەوردی لەوەی خوارەوە سەرنج بدەینە وەرگێڕاوی ماددەی (1)ی سایکس-بیکۆ لە دەقە ئینگلیزیەکەی و عەرەبیەکەی چەندە جیاوازەو ئەو ناوانە نەهاتون و ساختە هەیە :

1. That France and Great Britain are prepared to recognize and protect an independent Arab State or a Confederation of Arab States in the areas (A) and (B) marked on the annexed map, under the suzerainty of an Arab chief. That in area (A) France, and in area (B) Great Britain, shall have priority of right of enterprise and local loans. That in area (A) France, and in area (B) Great Britain, shall alone supply advisers or foreign functionaries at the request of the Arab State or Confederation of Arab States.

لە ئینگلیزیەکە ناوی عێراق و سوریای تێدا نیە، کەچی لە وەرگێڕاوە عەرەبیەکەدا بە ئەنقەست دانراوە، کوردیش لە عەرەبیەکە وەریدەگرێت و بەو شێوەیە دەکەوێتە هەڵەیەکی ستراتیژی یاسایی و سیاسی ترسناك ، بێ بەرامبەر خزمەتێکی گەورە بە پرۆژەی عروبە و رەسەنایەتی عێراق دەکا بێ ئەوەی بنچینەیەکیشی هەبێت.

پارچەپارچەکردنی کوردو عرب لەو ریکەوتنە دیارنەبوو بەلام لەپیشەکیەکە دەلیٚ بۆ عرب دەولەت یان کۆنفیدرالیەك لەدەولەتانیان بۆ دروست دەکەین ،ناوی کوردی تێدا نیە بەلام دیاریش نەکراوە ئەو پینج پارچەنوێیەی کوردستان چی لێدەکرێت ،ئەوناوچەیە زۆر بە خراپی دابەش کرا ، ، تەنانەت ئەو

دابەشیەی چاڵدێرانی 1514 تەنها بە خەملێنی باری سەربازی بوو نەك ڕێکەوتنی سیاسی و یاسایی، بۆیە سایکس-بیکۆ بە یەکەم دابەشی کوردستان لەمێژوودا دەژمێردرێت.

بە پێی ئەو ڕێکەوتنە ویلایەتی موسڵ (کەدەکاتە باشوری کوردستانی ئیستا)کەوتە سەر بەشی فەڕەنسا،بەلام هیزەکانی بریتانیا لە کەنداو بوو بەرەو فاو هات ،دوای سەرکەوتنەکانی بریتانیا لە (22)ی تشرینی دووەمی 1914 فاوی گرت، هەتا 11 ی ئازاری 1917 بەغداشیان گرت و لەپاش ئاگربەستی مۆدۆرۆسی 31 ی تشرینی یەکەمی 1918 شاری موسڵیشیان گرت ، دوای ئەو هەنگاوە سەربازیە بەریتانیا تەقەلای لەگەڵ (کلیمنسور)ی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسا دا لە کۆنگرەی (سان ریمۆ 1920) تا ویلایەتی موسڵ بگێڕێتەوە سەر بەشی بەریتانیا بە مەرجی خۆی ڕێکەوتن، ئیتر لەو سەودایە ئەو بۆچونە بەهێز دەکا، کە گوایە بەهۆی سامان کوردستان پارچەپارچە کرا، سەبارەت بەعیراق سیاسەتەکە ڕوون نەبوو لەسەرەتا ،هەروەك لە بروسکەی (چەچل) بۆ جەنەراڵە بەریتانیەکان لە مەیدانی جەنگ ڕونتر دەردەکەوێ و دەڵی دەوڵەتێکی عربی دروست بکەن هەر لە فاوەوە تا ئەو ناوچانەی کە هێزەکانی بەریتانیای پێ دەگا[1355]، (فقد جاء في برقية من الحكومة البريطانية الى المندوب السامي في بغداد يبلغه بأن يؤسس دولة عربية في مناطق التي تصلها نفوذ بريطانيا بإسم العراق)[1356]، هەروەها ئەوبروسکەیەی (چەرچل) بۆ خودی شا فەیسەلیش ناردوە ،تیایداخوارووی چیای حەمرین بە سنوری سەرووی (عێراقی دروستکراو)دیاری دەکا ، دەقی بروسکەکە دەڵێ: ئێمە بەلێنی پێك هێنانی دەولەتۆکەکی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆریەت بۆیە سنوری تۆ(جبل حمرين)ە لەوی بەسەرەوە کوردستانە[1357].

هەرچی سایکس پیکۆیە یەکەم جار لە ماددەکانی (1 و 2) باس لە دەولەتێکی وا کرا لە بەغدا تا بەسرە بێ ئەوەی ناوی عیراق بێت، دوای لە ڕێکەوتنی سان-ریمۆی 1920 و ڕێکەوتنی لۆزانی 1923 ویلایەتی موسڵیش خرایە سەری، لە ماددەی (94)ی سیڤەر دیاریکراو لەماددەی (132)ی

---

[1355] الأسلام والعلمانية...ص243
[1356] الإسلام والعلمانية ..ص238
[1357] بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانیا (fo 371/16367)تیلگرام ژ:616 هەمان ڕاستی دوبارە دەکاتەوە.

هەمان ڕێکەوتننامە دانی پیاهێنرا لەلایەن تورکیا، بەپێی مادەی (22) عصبە الامم خرایە ژێر ئینتداب، بەریتانیا خۆی بەڕێوەی دەبرد،بەو شێوەیە دەولەتی عیراقی پێ دروست بوو .

مەبەستە نهینیەکانی سایکس پیکۆ : ئەو ڕێکەوتنە یەکێکە لە نهینی ترین هەنگاو،بەشێکە لەتیۆری پیلانی ڕاستەقینە،دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 بە ڕێکەوت لە بارەگای وەزارەتی دەرەوەی روسیا لە بەلگەنامە دەگەڕان ودۆزیانەوە ،هەڵبەتە هەر ڕێکەوتنامەیەك دەکرێ چەند مادەیەکی ئاشکرای هەیە مۆری لەسەر دەکرێ، هەندێکیشی نهێنیەو نادرکێندرێ ، دەتوانین پوختەی ئامانجی ئیمپریالیزم وئاژانسەکانی زایۆن لە سایکس بیکۆ بدۆزرێتەوە ، تیایدا دەردەکەوێ ئەو دەولەتۆکانەی (وەك عیراق وسوریا وئوردەن وکوەیت وکەنداوی تر..) بەشێکن لە پیلانی ئیستعماری ، پانتایی نهێنی لەوە دێت کە بریتانیا وهێزەکانی رۆژئاوا دێت وجەنگێکی گەورە دەکاو نزیکەی 10000قوربانی تەنها لە عیراقی ئیستای داوە ،سالانە 35ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی سەرف بکا[1358]، دوای هەمو ئەو ماندووبوونانە بێت دەولەت بۆ عەرەب دروست بکابگەڕێتەوە شوێنی خۆی، دەبێ دەولەتی بریتانی خێرخوازبێت؟! وەك لە مشت ومڕێکی پەرلەمانی بریتانی ڕوویدا ووتیان با بریتانیا مەبەستەکەی ئاشکرا بکا ڕاستیەکەی بلێ داگیرکەرە خۆ خێر خوازنیە دەچی دەولەتیان بۆ دروست دەکا [1359]،لەکاتێکا بریتانیا خاوەنی مەبدەئی(بەرژەوەندی هەتا سەریە)یە ،یان وەك لە پرۆتۆکۆلی ژ:10 (بروتوکولات حکماء صهیون)ئەو هەنگاوەی بە (چاندنی مین) وەسف کردوە ، (لورانس) لەگفتۆگۆیەکیبۆ(تایمس) لە 7/23/ 1920 دەڵێت: من دلنیام دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانە بۆ عەرەب دلسۆزی و ئەمەکمان بۆ مسۆگەر دەبێ و نرخی سەنتیکیشی لامان نیە)[1360]...،(یاسین هاشمی-سەرۆك وەزیرانی عیراق) لە 1930/3/13 لە ووتاریکیدا دەلێت ئێمە هەر بە پەیماننامە نەبەستراینەوە بە بەریتانیا بەلکو بە هەندێ مادەی تر کە نهینین[1361]، لە

[1358] کوتلوف-پورە عشرین ص177 .

[1359] مشکلة الموصل ... ص261.

[1360]ـ کوتلوف-ثورة العشرین ص211

[1361]العراق فی ظل المعاهدات - المصدر السابق ج2ص222.

سەر ئەو بنچینەیە دەتوانین هەندێ مەبەست دیاری بکەین لە ئەنجامی ئەو ئەزمونە دوورو درێژە وپڕلە قەیرانەی ناوچەی سایکس پیکۆ ،بەکورتی لایەنە نهێنیەکانی سایکس پیکۆ ئەوانەی خوارەوەیە:

بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامی دابەش بیت و کۆتایی بەخیلافەتی ئیسلامی و زەمینە دووبارە بووەنەوەی نەمێنێت.

2-بۆ ئەوەی عەرەب بەرەو عروبە بگەڕێتەوە، کێشەی فەلەستینی داهاتووش نەبێتە کێشەی هەمو ئیسلام .

3-بۆ ئەوەی تواناکان و توخمی گەشەسەندن لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست پەك بخری و هەرچاویان لەبازاری ئەوان بیٚ .

4-نهێنی وئامانجێکی تری ئەوە بوو کە رۆژهەلاتی ناوەڕاست هەر لەنائارامی بمینیتەوە .

5-بۆ ئەوەی عەرەب وجیهانی ئیسلامی بەگشتی دوا کەوێت وتوخمی گەشەی بوەستێت ، هەردەم چاویان لە رۆژئاوا بێت .

6-هەمو ئەو ئامانجانەش ولاٚتێکت بۆدروست دەکەن، دەسەلاٚتداری دکتاتۆری بیٚ، دوور لە دیموکراسی هەلٚدێنی.

7-ئەو دابەشیە ئیدارەی عوسمانیشی تێك وپێکدا و وای کرد بیرۆکەی ویلایەت لەمیشکی هەموان دەرچێت .

8-لەکۆتاییدا سەرهەلدانی ئەو دەولٚەتە دەستکردو نامۆیانە دەبیتە هۆی ئاسایی بونی سەرهەلٚدانی دەولٚەتێکی ئیسرائیلی نامۆ لەناوچەکە دوای یەك سال لە سایکس پیکۆ بەلینی بەلفۆری بەدواداهات ، واتە دروست کردنی دەولەتی دەستکرد تا جێی دەولەتێکی دەستکردی وەك ئیسرائیلی لێببێتەوە .

ئەنجام وکاریگەریەکانی سایکس پیکۆ : ئەوکاتی تیڕوانینی ئیستعمار بۆ میراتی عوسمانی (بە تایبەتی ناوچەعربیەکان) وەك ولاتانی (ئەمریکاونیوزلەندو ئوسترالیاو ئەفریقا) بەبێخاوەنیان

تەماشادەکرد ، پێیان وابوو پەیوەندیەکی وا لە نێوان میلەت ونیشتمانەکەی نیە ،واتە نەمیلەتەکەی دروست بوە نە هەرێمەکەی ،کە لەمادەی (1)ی کۆنگرەی مۆنتفیدیۆ مەرجی بەدەولەت بوونن، بۆیە هەر زوو بیریان لە سیستەمی ئینتداب کردەوە وەك سێ پۆلی (A, B, C) ئەوەی دواى بۆوولاتانی عربی بوو ، زۆربەی ئەو زاراوانەی وەك ئەیتیما(atima)[1362] ، (ارض لاصاحب لها- res nnullius)ئەو کاتی زیاتر لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستیش سەری هەلدا،ئەیتیما بەو میلەتانە ووتراوە کە مقەوەماتی کۆمەلایەتی وسیاسی و شارستانی وفەرهەنگی لاوازەبە،( res nnullius )یش بەو ناوچانە دەووترا بیخاوەن بوو[1363] ، لەلایەکی تریش ئەو ناوچەیە لە مێژبوو ناوەندی هەڕەشە بوە بۆ رۆژئاوا بۆیە بنەماکانی سایکس پیکۆو بەشداربوانیان فراوان تر کرد،هەنگاوی تریان نا، ئەو هەلمەتە ئیستعماریە هەمو لایەکی گرتبۆوە بەروسی کردنیش لە سەردەمی پیش شۆڕشی ئۆکتۆبەر هەبوو ، فەرهەنگی سیاسی (ئارش) دەلی بەروسی کردن لەسەردەمی ئیمپراتۆریەکان ودواش لە سەردەمی شیوعیەتیش هەبوە بۆ تواندنەوەی میلەتانی تر لە روسی[1364]، هەتا سەردەمی سۆڤیەتیش بە ڕوسی کردن هەبوو کە پێی دەووترا (ترویسیە)بەو هەولانەی ستالین دەووترابۆ بە ڕوسی کردنی زمان ونەریت وفەرهەنگی کۆمارەکانی تری سۆڤیتی[1365]، ئەوەی روسی وسۆڤیەتی زیاتر ڕوو لە کۆمارو ناوچەکانی دەوروبەری بوو ،هەرچی ئیمپریالیزمی رۆژئاواییە ڕووی لەهەمو دونیا بوو ،بۆیە ناو لە بەریتانیا نرابوو (ئەو وولاتەی رۆژی لێئاوانابێت )، لەوچوارچێوە ئیستعماریە دوای سایکس پیکۆبە سالێك بەلینی بلفۆر دێت ، ریکەوتنامەکانی تری وەك:( سان دی مودریان 1917)، (ڤێرسای 1919)، (سان ریمۆ1920)، (سیڤەر1920)، (کۆنگرەی قاهیرە1921)، (لۆزان 1923)، لەکۆتایدا لە ریکەوتنامەی سیڤەری 1920 خەملین ئەو دەولەتانەی لێ دروست بوو ، بەو شیوەیەی خوارەوە: سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی 94 هەتا 97. ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (95). حیجاز بەپێی ماددەکانی (98-99). میسر لەمادەی (101)،.. لەو کاتیەوە کە

---

[1362] جاروایە ئەیتیما بەو دەولەتانە ووتراوە کە پیگەیان لە نیو دەولەتان لاوازە، بڕوانە: معجم مصطلحات عصرعولمة ص23 .

[1363] الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية ص19

[1364] فەرهەنگی سیاسی (ئارش)ل84

[1365] الموسوعة الميسرة ص100

سایکس پیکۆ بەرجەستە بوە تا ئەوساتە کە دەکاتە یەك سەدەی تەواو هەر لە کێشەدان وەك لە کتیبی (حتميه التغير ..) لەو خالانەی کۆکردۆتەوە 1- توندو تیژی وجەنگی بەردەوام 2-نەگونجانی جهانی عربی لەگەل سەردەم 3- ناکۆکی ناوەکی 4-نەبوونی ئازادی 6-بەگژداچوونەوەی پیشکەوتن وخۆبەستنەوە بەدەسلاتی خیلایەتی7-تاکە ڕێگەی گۆڕان تیرۆر وئینقلاب بوە[1366] .

دەتوانین خالی تریش زیاد بکەین بەو شێوەیەی خوارەوە :

أ- ئەو ئامانجانەی سایکس پیکۆ کەلەسەروو دیاری کرا زۆربەی هاتۆتە دی .

ئینجا لە هەمویان مەترسیدارتر دروست بوونی ئەو دەولەتانەی عربی کاریگەریەکی وایان نەبوە بۆ پیشکەوتنی عەرەب ،چۆنی وێنەیان کردبوو وادەرچوو - بروتوکول رقم (10)من البروكوتولات الصهيونية : (اننا نعتمد على اجتذاب كل الأمم للعمل على ان نشيد الصرح الجديد الذي وضعناه ونحن نصممه)[1367] .

لەکاتی دروست کردنیان لە سایکس پیکۆ لۆرانس(بریتانی) ئەوەی ئاشکرا چۆن ووتبووی بەشێوەیەك وولاتانی عربی دروست دەکەین کە نرخی سەنتەکیان نەبێت[1368]،دوای نیوسەدە چەندین سەرۆکی عەرەبی لەدوای لۆرانس ئەوەیان دووبارە کردۆتەوەو وولاتانی عربیان بە سفر نرخاندوە ، بە پیچەوانە هەندێ جار دەلێن نەبوونی باش ترە ، دوای ئەوەی سعد زەغلول ووتی ئەو دەولەتان بە (سفر )هەژمار دەکرێن جا ئەگەر لە کۆمکاریش کۆ ببنەوە هەر بریتیە لە کۆی 22 سفر[1369]، لە دوای ئەو معمر قەزافی خراتری ووت ووتی وولاتانی عربی یان سفرن یان سالب یەکن .

شیخ ئەمجەد زەهاوی لە ووتاریکیدا لە 1953/3/22 بەبۆنەی هاتنە سەرتەختی شافەیسەلی دوەم لە عیراق دەلێت: لەدوای سایکس پیکۆ و دیزاینی رۆژهەلاتی ناوەراست ونەمانی خەلافەت

---

[1366] د احمد طحان-حتمية التغير فى الشرق الأوسط،دارالمعرفة ط12006م،بيروت ص22-23 .

[1367] انظر: نص البروتوكولات في كتاب: رسائل.. المصدر السابق ص 59-60

[1368] كوتلوف- ثورة عشرين ص211

[1369] من قضايا الثورة والانسان العربي... المصدر السابق ص29 (فى الأصل كلام عن الأصفار تعودالى سعد زغلول، كما نـأتي عليه بعد قليل )

موسولمانان ئیستا ڕێسوان لەچاو جارانی سەربەرزی، هەژاربوون لەدوای دەولەمەندی،لاوازبوون دوای بەهیزیان،دواکەوتەو پاشکەوتە لەدوای ئەوەی ئەوان پیشڕەو بوون[1370] .

لەوەتەی سایکس پیکۆ تا ئیستا هەم عرب لەیەکتر جیاکرانەوە هەم لە ئیسلام جیاکرانەوە ، داود ئۆغلۆ پێی وایە پتەو کردنی ناو ناوەڕۆکی ئەو دەولەتە عربیانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست پیویستی بە لیکجیاکدنەوەی ئاین لە سیاسەت ودەولەت وفەرهەنگ وکردوە واشیان کرد، بۆیە دەبتە سەرچاوەو قەیرانی دواکەوتەیی وناسنامە[1371]،قەیرانی جیابوونەوەی عەرەب لە میلەتانی ئیسلام ، زاراوەی وەك الامه العربیه یان (الأمتي العربية والإسلامية) بەکار هات بۆ زیاتر بەرجەستەکردنی ئەو لێك جیاکردنەوەیە، لە لێك جیاکردنەوەی عەرەب وئیسلام ئۆتۆماتیکی دەبێتە هۆی پارچەپارچەکردنی عەرەبیش،بۆ ئەو مەبەستە یەکێ لەمەرجەکانی دروست بوونی وولاتانی عەرەب بریتی بوو لەوەی کە لە ناوەخۆ یەکنەگرن نە لەگەل جیهانی ئیسلامیش ،هەروەك لە مەرجی دروست بوونی وولاتی لبنان بە ڕوون تر هاتبوو ،کە لە ڕێکەوتنی (بشار الخوری المسیحی) و(ریاض الصلح المسلم )کە بە (میثاق لبنان-خوری —صلح) بەناوبانگەدەقەکەی وایە: أن يكف المسلمون عن المطالبة بالوحدة مع سوريا أو أية وحدة عربية، وان هذا شرطٌ للإستقلال[1372]، فۆرستەر دەلێ هەمان مەرج بە نهێنی بۆ مەلیك فەیسەلی عیراقیش دانرا [1373] .

ب-ئەو ناوچەیەی سایکس پیکۆ لەهەمو جیهان دواکەوتوو ترن،دواکەوتەییان لە چوارچێوەی پرۆژەکانی چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەدرێژی باس کراوە ،تا ئیستاش ئەو وولاتانە لە کۆمەلەی جیهانی سێیەم هەژماردەکرێن ،هەندیکیشیان بەوولاتی شکست خواردو(الدوله الفاشله)، وەك ناعوم چۆمسکی لەتویژینەوەیەکی(الدول الفاشله)وایان وەسف دەکا لە جیهانیش تەنها ئەوان ماونەوە بە دیکتاتۆریە ..

ت- ناوچەی سایکس پیکۆ هەر نائارام وکێشەیە ،هەردەم ناکۆك بووینە ،بەجۆریك ڕۆژهەلاتی

---

[1370] الامام امجد الزهاوی —کاظم المشایخی ص312 .

[1371] العمق السترانیجی ص364

[1372]:سعدالدین ابراهیم —ملل والنحل والأعراق ص595

[1373]فورستر.- نشأة العراق ص156

ناوەڕاسستیان دابەشکردوە ئەو کۆمەڵە دەوڵەتۆکانەیان لیّ دروستکرد، بۆ ئەو مەبەستەش سایکس پیکۆ سنورەکان لەسەر بنچینەیەکی (سیاسی، ئیداری، جوگرافی، نەتەوەیی، تایفی، میژوویی...) دیاری نەکردوە، بەڵکو تاکە ستاندەرو پیۆەر ئەوەبوو چۆن لە بەرژەوەندی ڕۆژ ئاواو ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیلی چاوەراونکراو دروست کرابوو، بۆیە لەهەر وڵاتێك لەو وڵاتە دەست کردانە کۆمەڵیك کیشەیان تیدا چاندووە، لەشیوەی بۆمب وەك لە (بروتوکولات حکماءالصهیون ژمارە: 10 هاتووە)، بەشیوەیەك کە بەشیکی تورکمان خراوەتە سەر عەرەب، عەرەبیش خراوەتە سەر تورکیا، فارس لەسەر عەرەب و پیچەوانەش، کوردستان کراوەتە (5) بەش بەسەریان دابەشکراوە ، عەرەبی خستۆتە سەر تورك ،شیعەی خستۆتە سەر سونە،کوردی خستۆتە سەر هەموان ..بەو شیوە ناوچەی سایکس پیکۆ نا ئارام ترین شوینە لە جیهان ،کە بریتین لە وولاتانی عربی ، لە ئەنجاما ڕیسای (اتفق العرب علی أن لایتفق) هاتە کایەوە .

ب- دیموگرافیای ناوچەکە گۆڕدرا ،لەلایەن دەسەلاتدارانەوە پاکتاوی رەگەزی کرا ،خاکیان تەسك کرایەوە ،یەهودیەکان بەرامبەر عەرەب لە فلستین ،عەرەبی عیراق وسوریا بەرامبەر کورد،سونە بەرامبەر شیعە ،تورك بەرامبەر کورد، ...دوونمونە: ژمارەی یەهود پیش سایکس پیکۆ(1890ز)لە فلستین 20000یەهودی بوە ،سالی1947گەیشتە 100000 کەس ،سالی دوای بوە 200هەزار ..شمی سمتر، بەهەمان شیوە ژمارەی عرب لەکرکوك پیش سایکس پیکۆ وەك لە (قاموس الاعلامی عوسمانی) دەلیّ کەرکوك شاریکی کوردستانیە و4/3ی کوردن، ئەوەی تریشی تورك وعەرەبن، 760 ئیسرائیلی و460کلدانی لییە. لە نیوان هەردووئاماری 1957 و1977 عەرەب لە کەرکوك 2 ,28٪بەرز بۆوە بۆ44,4 ٪، هەرچی کوردە ڕیژەی کەم بۆوەلە (48,3 ٪) بۆ(37,6 ٪) .

ج- وولاتانی سایکس پیکۆ بیبەرگەن ،بەسانایی داگیرو دابەش دەکرین ، لەو بارەیەوە لۆرانس لە ڕاپۆرتیکی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانی بەناوی ((سیاسە مکە -1916) نوسیبووی :ئەو

[1374] بۆ ئەو زانیاریانە بڕوانە: د محمدمورو –زوال دولة اسرائیل –مکتبة جزیرة-قاهرة ،ط1 ص52

دابەشیەی عرب زۆر سود بەخشە  هەر بە ناكۆكی یەكتر خەریك دەبن هەرگیز یەكناگرنەوە فهیسەتر، وەزیری كۆلۆنیالیەكانی بەریتانیاش پشتگیری ئەو هەنگاوە دەكا لە ڕاپۆرتێكی بۆ سەرۆكی حكومەتی بریتانیا لە 9/ینایر/1938 دەلیٚ دابەشیەكەی سایكس پیكۆ زۆر ڕاست دەرچوو ئەگینا ئیسلام دەبوە گەورەترین كۆسپ لە پێشمان[1376].

ح- دەسەلاتەكانی عەرەبی توندن بەرامبەر میلەتی خۆیان وزۆر نەرمیشن بەلام دوژمنیان بە هۆی نەگونجانیان لەگەل میلەتانی خۆیان ناچار دەبنە دلسۆزی ئیمپریالیزم ورۆژئاوا وەك ویلسۆن پیشبینی كرد واهاتە دی [1377].

خ- زۆربەیان ئاشتیان لەگەل ئیسرائیل كردوە و تەنانەت ئەندامی عربی هەیە لە كنیسەی ئیسرائیل كەچی ئەو ئاشتیە لەگەل میلەتانی خۆیان ناكەن، ئامادە نین وەك چۆن دانیان بە ئیسرائیل نا نیو ئەوەندە دان بە كورد بهێنن .

د- سەرهەلدانی كیشەكانی فلستین وكورد وكیشەی كەمایەتی تری وولاتانی عربی و ... بە كورتی بەشی هەرە زۆری میلەتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست زەرەر مەندبووینە لە سایكس پیكۆ بەو شێوەیەی خوارەوە:

كوردستان كرا (5) پارچە ودابەشكرا بەسەر ولاٚتانی دەورو بەر، عەرەبیش كرا 22 پارچە، توركیاش لەو ئیمراتۆریەتە مەزنیەوە بووە ولاٚتێكی بچوك ، دەولّەتی عیراق و سوریا و كوێت... زادەی ئەو زەمینە و پلانەن، ئەو دەولّەتانەودەولّەتی ئیسرائیلیش لەهەمان كارگە دروستكراون، بەلاٚم ئیسرائیل پیشكەوتوە و بۆ ناوەخۆی دادگەری دیموكراسی هەیە، هەرچی ولاٚتانی عەرەبی و داگیركەرانی كوردستانن هەر لەشەڕو شۆرو دیكتاتۆری و پاش كەوتویدان، بەواقیعی بەرجەستەی مەبەستەكانی سایكس بیكۆیان كردوە، كەواتە میللەتانی عەرەب و كوردو تورك... هەموی زەرەری كردووە (جگە لە دەسەلاٚتدارانی خۆپەرست)، بەلاٚم ئەوەی زۆر زیان بەخش بوە سیٚ لای ترە:

---

[1375]كتاب(ملك فیصل الاول ) ص18 (مأخوذ من وثائق وزارة الخارجیة البریطانیة رقم 461/414 – f0371

[1376] الموسوعه المیسرهفی الادیان والمژاهب المعاصره ... المصدر السابق ص40

[1377] كوتلوف... المصدر السابق ص 263.

1- کورد هەم دابەشکرا هەم بێ بەشکرا لەمافی چارەنوسی بەدەوڵەت بون.
2- ئاینی ئیسلام، خیلافەتی هەلوەشایەوە وخانەنشین کرا، دەستورو دام و دەزگای عەلمانی و زەمینەیەکی وا لەرۆژهەلاتی ناوەراست سازکرا کەبوار بەزیندوو بونەوەی نەدرێ.
3- گەلی فەلەستینش هەم دابەشکران و هەم بی بەش کران مافی چارەی خۆنوسی و بەدەوڵەت بون، فەلەستینش وەك کوردستان دابەشیش کرا بۆ چوار بەش، بەشیك کەوتە ژێر دەستی راستەوخۆی ئیسرائیل، تائێستاش بە عەرەب 1948 ناودەبرین، بەشی غەزە درا میسر، بەشی زیفەش[تحى سمتر] درا ئوردەن وقودسیش ئەو کات خرا سەر پارێزگاری نێو دەوڵەتی، ئەو دوو میلەتە بیبەش گران بێئەوەی هاوپەیمانان بەدوای سیڤەر بن نە ویلسۆنیش بەدوای مادەی 12 بوو .

گرنگ ترین ئەنجام وکاریگەری خراپ ئەوەبووە توانیان ڕای گشتی میلەت وبەرگری میلی لە گۆڕەپان دوور بخەنەوە ،بیدەنە دەست دەولەت ودەولەتیش بە لاوازی ،شەڕوبەرگری ئەو دەولەتانەش بەرامبەر رۆژئاوا زۆر ناهاوسەنگە ، ئەگەر سەرنج بدەینە هەردوو جەنگی ئیسرائیل لەگەڵ عەرەب لەسالی 1967 و1972 لەگەڵ ولاتانی عەرەب، تەنها بە (6) ڕۆژ ئیسرائیل سەرکەوت،هیرشی ئەمریکا بۆ سەر عیراق لە 1991 و دوایش لە 2003 بە چەند رۆژێك یەکلا بۆیەوە ،ئەوە جەنگ وبەرگری دەولەت بەرامبەر دەولەت ئاوابوو ، بەلأم هێرشەکەی ئیسرائیل بۆ سەر حزب الله لە تەموزی (2006) وهێرشەکەی بۆسەر غەزە لە 2009هەریەکە زیاتر لەمانگی خایاندو بەتکنەلۆجیای زۆر بالأتریش بەشکستی گەرایەوە.

کەواتە دەتوانین بلێین ئەو دەولەتانەی زادەی سایکس پیکۆ بۆ بەرگری نیشتمانی خۆیان دروست نەبووینە ،بۆ ئامانجە عەرەبیەکان نین،دروست تر بلێین ئەو ولأتانە لە بنەچە بۆ دژی یەکێتی عەرەب وبۆ پاریزگاری ئیسرائیل دروست بووینە، لەدوا هێرش ئیسرائیلیش بۆ سەر غەزە لە (2009) ولأتانی ئوردن و میسرو سعودیە و دەسەلأتی فلستین لایەنگیری ئیسرائیلیان کرد، تائەو ساتەش ئابلوقە خراوەتە سەر فلستین لەلایەن عەرەب خۆی.. لەوەش خراتر سەربردەی زۆرهەیە کە تەکانی میلی هەبوە بۆ بەشداری کردنی خەلکی ڕاستەوخۆ بۆ یارمەتی فەلەستینیەکان کەچی لای دەولەتە

[1378]ـ بۆ یەکەم جار لەسالی 1950ئوردەن ناوی لەو ناوچەیە نا (الضفة الغربية)لەدوای ئەوەی لەگەل ئیسرائیل ڕێك کەوتن.

عربیەکانی زادەی سایکس پیکۆ ڕێگریان لێکراوە ،لەکوردستان لە دوای دروست بوونی ئیسرائیل خەلکی وەك جیهاد بۆ شەڕی فلستین چووینە لەلایەن رژیمە عربیەکان گیراون ،لەکتبی(حول خط الاستراتیجی) ئەوباسانە دووپات دەکاتەو دەلێ ئەو رژیمانە زیاتر ئەرکیان رزگارکردنی فلستین نەبوە بەلکو شۆرشگێرانی فلستینی چەك بکەن[1379]، هەر لەو کتیبە دەلێ لەسالی 1936 رژیمە عربیەکان شۆرشی فەلەستینیان ئابلوقەداو کوژاندیانەوە لە جیاتی بریتانیا ،هەر ئەورژیمانەش بریاری دابەشی فلستین وجیگیرکردنی دەولەتی ئیسرائیلیان خۆش کرد،دەشلی رژیمی ئوردەنی لەهەموان خراتر بوو ،هەر دروست بوونی ئوردەن بەمەرجی پاسەوانی لە ئیسرائیل بوە .بۆیە بریتانیا بەشیکی لە فلستین بە ئوردەن داو وەریگرت (زیفەی غربی)[1380] .

هەلە لەچارەسەری: زۆربەی پرۆژەکانی جیهانی بۆچارەسەری رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەهەلە دەدرێ ،لەبارەی تەوەری رزگاری کۆمەلایەتی ئەوا کیشەکانی مافی مرۆڤ ودیموکراسی وگەشەو تەعلیم زەق دەکەنەوە ،لەبارەی تەوەری رزگاری نیشتمانیش ئەوا دۆزی فلستین بەتەنها زەق دەکەنەوە ،زۆربەی خۆی لە کێشە بنەڕەتیەکە دزیوەتەوە ،نالێن ئەوە سایکس پیکۆیە سەرچاوەی کیشە سەرەکیەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە ،هەندێ لای ئیسلامی ئەو ڕاستیە دەلێ ، بۆنمونە لە گەل راگەیاندنی خەلافەتی داعش لە 2014ریکەوتنامەی سایکس پیکۆی هەلوەشاندەوە ، تاڕادەیەك پرۆژەکانی ئێرانیش ئەو پەیامەی دژ بە سایکس پیکۆی تێدایە ،هەرچی بەشیکی ترە لە ئیسلامیە عربەکان زۆربەی کیشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ دۆزی فلستین دەگێڕیتەوە ،وەك نمونە (حزبی تەحریری ئیسلامی) پێی وایە لە90٪ی کیشەکانە،وەك دەقەکەی خۆی :( وأما بالنسبة للكيان اليهودي المزروع في فلسطين، فأصبح محور قضيةالشرق الأوسط، وأصبح سببًا لعدم الاستقرار، لا في هذا الشرق الأوسطوحسب، وإنما في العالم كله، وذلك باعتراف الغربيين أنفسهم الذين أقروا بأن ٩٠ % من

---

[1379] ناجی علوش-حول الخط الاستراتیجی العام لحرکتنا ولثورتنا ص86 .

[1380] حول الخط الاستراتیجی العام ..ص106 وص107-112

مشاكل العالم الإسلامي التي تؤرق الغرب، إنما تعود إلى مشكلة وجود الدولة اليهودية في فلسطين، أي في قلب العالم الإسلامي)[1381].

داود ئۆغلۆش پێی وایە ئەو کاریگەریە خراپەی بەسەر رۆژهەلاتی ناوەڕاست (بەتایبەتی شپرزەی فەرهەنگی )سەرچاوەکەی بە یەهودی کردن وهینانی فەرهەنگی جیاجیای یەهودی جیهانە بۆ ناوچەکە[1382]، فراوانی ناکات وبلێت سەرچاوەکەی سایکس پیکۆیە ،هەرچەندە لەهەندێ شوینی تر داود ئۆغلۆ باسی سایکس پیکۆی کردوە ، بەگشتی لەسەر ئاستی جیهان هیشتا دان بەوە نانرێ کە هەلوەشاندنەوەی سایکس پیکۆ سەرەتای دەست بردنە بۆ چارەسەریەکان ،هەرچی دام ودەزگا عربیەکانیشە کەمتر بەلای ئەو چارە ڕیشەییە هاتون ، زۆربەی جار سایکس پیکۆ پتەو دەکەن ،رازین بەو دۆخەو دەولەت بوونیان ، زۆر جاری تر تووشی جۆرێك لە دووڕوویی ونیفاق دەبن کاتێ وەسفی ئەو سنورانەی نێوان وولاتانی عربی دەکەن ودەلین ئەوە ئیستعمارو سایکس پیکۆ دیاری کردوەو هیچ بنچینەی نیە ،کاتێ دێنە سەر بابەتی میلەتانی بێبەشکراو لە مافی چارەنوس ئەوا بە خیرایی باسی پیرۆزی دەولەت وسنورو یەکێتی خاك دەکرێ .

---

[1381] مفاهيم سياسية حزب التحرير ص99

[1382] احمد داوداوغلو – العمق الستراتيجى (موقع تركيا ودورها فى الساحة الدولية )ص414

(45)

# ڕێکەوتنامەی سیڤەر اتفاقیه سیفر sevres Agreemnt

**ئەوانەش دەگریتەوە ( وولاتانی تەوەر، وولاتانی هاوپەیمانی ،کۆنگرەی سانجرمان،کۆنگرەی نۆی،کۆنگرەی ڤیرسای،...)**

سیڤەر یەکێکەلەو زنجیرە کۆنگرانەی بۆ پرسی رۆژهەلاتی ناوەڕاست کرا له پیش جەنگو کاتی جەنگ ودوای جەنگ ، ئەوانەی پیش جەنگ زیاتر پیلان وپلان بوو لەسەر عوسمانی [1383]، هەرچی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم (1914-1918 ) بۆ ئاشتی وسەپاندنی سیستەمی نوێی جیهانی بوە ،بەشێکیش دەلێن سەپاندنی مەرجی وولاتانی براوە بوە بەسەر دۆڕاو ، ولاّتانی (تەوەر-محوەر) دۆڕاوەکان بوون بریتی بوون لە : ئەلّمانیا ،مەجەر و نەمسا، بولگاریا، دوایش عوسمانی . دەولەتە براوەکانیش هاوپەیمانان بوون بریتی بوون لە: بەریتانیا ، فەرەنسا ، ئیتالیا، بلجیکیا، ئەمریکا، ڕوسیا ، دوای بۆ هەریەکە لە ولاّتانی دۆڕاویش کۆنگرەی تایبەتی سازکرابە مەبەستی هێنانەدی ئامانجەکانی هاوپەیمانان ، لەو میانە کۆنگرەی (فرسای) بۆ ئەلّمانیا لە 1919/7/28ساز کرا، کۆنگرەی (سان جرمان) لە 9/30/ 1919بۆ نمسا. کۆنگرەی (نوی) لە1919/11/27بۆ بولگاریا و مەجەر،کۆنگرەی(رابۆلۆین)لە1920/11/12بۆئیتالیاویۆگوسلاڤیا،کۆنگرەی(ریگ)لە 3/18/ 1921 بۆ روسیا وپۆلۆنیا..،هەرچی کۆنگەری سیڤەر بوو تایبەتە بەعوسمانی کە لە 10 /8/ 1920بەسترا لە شاری سیڤریسی فرنسا ، پێك هاتبوو لە 433 مادە ،بریتیە لەپەیمانی ئاشتی نێوان هاوپەیمانەکان و هێزە پەیوەندیدارەکان وعوسمانی مۆرکرا، لەو کاتیەوە ئەو ڕێکەوتنە بە ناوی ڕێەوتنی سیڤەر بەناوبانگە ( SEVER)وەك لە عربیەکەی باوی وەرگرتوە ،بەلام لە بنەچەدا بەو شێوەیە :(SEVRES) (سیڤریس) نەك سیفەر.

بەشداربوان (لەو ڕێکەوتنە لە جیاتی عوسمانی تورکیا بەکارهاتوە)

---

[1383] لەو کۆنگرەیە ناوی عوسمانی بە تورکیا هاتوە .

له دیباجەی سیڤەر وا وەسفی ئەو ڕێکەوتنە دەکا : هەریەك لە ئیمبراتۆریەتی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و یابان، وەك هاوپەیمانە بنەڕەتییەکان وەسف کراون، هەرچی ئەرمینیا و بەلجیکیا و یۆنان و حیجاز و پۆڵەندا و پورتگال و ڕۆمانیا و دەوڵەتی سیرب و کروات و سلۆڤینیا و چیکۆسلۆڤاکیا لایەنێك پێك دێنن، تورکیا لایەنەکەی تر پێك دێنێ .

لەسەر داوای حکومەتی ئیمپراتۆری عوسمانی لە 30 تشرینی دووەمی 1918 ئاگر بەست لەلایەن هێزە هاوپەیمانە بنەڕەتیەکان بە تورکیا بەخشرا (کە بە ئاگر بەستی مۆدرس بەناوبانگە)بۆ ئەوەی پەیمانی ئاشتی بە ئەنجام بگەیەنرێ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هێزە هاوپەیمانەکان وەك یەك بە پێویستی دەزانن کە ئاشتییەکی جێگرو دادەوەرانە و درێژخایەن جێێ جەنگ بگرێتەوە، ئەو جەنگەی  یەك لەدوای یەك راستەو خۆیان ناڕاستە وخۆی دژی تورکیا تێوەی گلابون، کە لە بنەڕەتدا لە 28ی تەموزی 1914  لەلایەن حکومەتی ئیمپریالی و شانشینی نەمسا- هەنگاریای پێشوو دژی سربیا راگەیەنرا، هەروەها بەو دوژمنکارییانەی کە تورکیا بەرامبەر هێزی هاوپەیمانان لە 29ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1914 کردی و بوە هاوپەیمانی  ئەڵمانیا . بۆ ئەم مەبەستە لایەنە باڵایە گرێبەستەکان ئەمانەی خوارەوەیان وەك باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خۆیان دەستنیشان کردوە:

**بەریتانیا :** خاوەن شکۆ شای شانشینی یەکگرتووی بەریتانیای مەزن و ئایرلەندا و موستەعمەرە سەربەخۆکانی ئەودیو دەریا، ئیمبراتۆری هند .

- بەڕێز جۆرج دکس گراهام وەزیری دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆی بەریتانیا لە پاریس، بە نوێنەرایەتی موستەعمەرەی سەربەخۆی کەنەدا.

1- ڕێزدار ڕێز جۆرج هەڵسی پێرل کۆمیسەری باڵای کەنەدا لە شانشینی یەکگرتوو، بە نوێنەرایەتی کۆمنوێلسی ئوستراليا.

2- پایەدار ئەندرۆ فیشەر کۆمیسەری باڵای ئوستراليا لە شانشینی یەکگرتوو، بە نوێنەرایەتی موستەعمەرەی سەربەخۆی نیوزلەندا.

3- بەڕێز جۆرج دكس گراهام باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شكۆی بەریتانیا لە پاریس، بەنوێنەرایەتی یەكێتی ئەفریقیای خواروو.

4- بەڕێز ریجنالد ئەندرۆ بلانكنبێرگ كۆمیسەری باڵای یەكێتی ئەفریقیای خوارو بەوەكالەتی شانشینی یەكگرتوو، بە نوێنەرایەتی هند.

5- بەڕێز ئارسەر هرتزل یاریدەدەری جێگری وەزیری دەوڵەت بۆ كاروباری هند.

**فەڕەنسا:** سەرۆك كۆماری فەڕەنسا.

6- بەڕێز ئەلیكساندەر میلەراند، سەرۆكی ئەنجومەن، وەزیر بۆ كاروباری دەرەوە.

7- بەڕێز فردریك فرانسوا مارسال، وەزیری دارایی.

8- بەڕێز ئۆگەست پۆل-لویس ئیسحاق، وەزیری بازرگانی و پیشەسازی.

9- بەڕێز جولس كابۆت، باڵیۆزی فەڕەنسا.

10- بەڕێز جۆرج مۆریس پەلیۆلۆگ، باڵیۆزی فەڕەنسا، سكرتێری گشتی وەزارەتی كاروباری دەرەوە.

**ئیتالیا:** خاوەن شكۆ شای ئیتالیا.

11- خانەدان لیلیۆ بۆنین لۆگیر، ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی (سەنەتۆر)ی شانشین، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراو خاوەن شكۆ پاشای ئیتاڵیا لە پاریس جەنەراڵ جیۆڤانی ماریتی، نوێنەری سەربازی ئیتاڵیا لە ئەنجومەنی باڵای جەنگ.

**ژاپۆن :** خاوەن شكۆ ئیمبراتۆری یابان.

12- خانەدان چیندا، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شكۆ ئیمبراتۆری یابان لە لەندەن.

13- بەڕێز ماتسیۆ، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شكۆ ئیمبراتۆری یابان لە پاریس.

**ئەرمەنستان :** بەڕێز ئاڤێتیس ئەهارۆنیان، سەرۆكی شاندی كۆماری ئەرمینیا.

**بەلجیك :** خاوەن شكۆ شای بەلجیكییەكان.

14- بەڕێز جولس ڤان دین هیوڤل، نێردراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراو، وەزیری دەرەوە.

15- بەڕێز رۆلین جاکمینس، ئەندامی پەیمانگەی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت، سکرتێری گشتی شاندی بەلجیکی.

**یۆنان:** خاوەن شکۆ شای یۆنان.

16- بەڕێز ئیلێفسێریۆس ڤێنیزیلۆس، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

17- بەڕێز ئاسۆس رۆمانۆس، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ شای یۆنان لە پاریس.

**عەرەب :** خاوەن شکۆ شای حیجاز.

**پۆڵەندا :**سەرۆك کۆماری پۆڵەندا.

18- خانەدان مۆریس زامۆیسکی، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی کۆماری پۆڵەندا لە پاریس.

**پورتوگال :** بەڕێز ئیراسمی پیلتزسەرۆك کۆماری پورتوگال.

19- دکتۆر ئافۆنسۆ داکۆستا، سەرۆکی پێشووی ئەنجومەنی وەزیران.

**رۆمانیا:**خاوەن شکۆ شای رۆمانیا.

20- بەڕێز نیکۆلا تیتۆ لێسکۆ، وەزیری دارایی.

21- شازادە دیمیتری چیك، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ شای رۆمانیا لە پاریس.

سربیا(یۆگوسلاڤیا): خاوەن شکۆ شای سیرب و کروات و سلۆڤین.

22- بەڕێز نیکۆلاس پاچیتچ، سەرۆکی پێشوی ئەنجومەنی وەزیران.

23- بەڕێز ئەنتی ترومبیك وەزیر بۆ کاروباری دەرەوە.

**چیکۆسلۆڤاکیا:** سەرۆك کۆماری چیکسلۆڤاکیا.

24- بەڕێز ئیدوارد بینیس، وەزیر بۆ کاروباری دەرەوە.

25- بەڕێز ستیڤن ئۆسوسکی، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵاتی پێدراوی کۆماری چیکسلۆڤاکیا لەلەندەن.

**لای بەرامبەر تورکیا:** جەنەراڵ هادی پاشا (سەنەتۆر) ڕەزا تۆفیق بەگ، سەنەتۆر.

26- ریچاد هەیس بەگ، نێردراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی تورکیا لە بێرن.

ئەو کەسانە(کە لەسەروو ناویان تۆمارکراوە ) تەواوی دەسەڵاتی خۆیان بەکارهێناوە بەشێوەیەکی لەبار و ئاسایی و لەسەر ئەمانەی خوارەوە ڕێك کەوتوون:

هەر لەکاتی جێبەجێ کردنی ئەم پەیماننامەی ئێستا باری جەنگ کۆتایی دێت و پەیوەندی فەرمی لەنێوان هێزە هاوپەیمانەکان و تورکیا دێتە کایەوە.

**ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکە :**

ماددەی 1 هەتا 26 تایبەتە بە (پاشکۆبەشی یەکەم پەیمانی ڤێرسایل Versailles لاپەڕە 10-23 ). مادەی 27 تا مادەی 61 بریتیە لە سنوری تورکیای نوێ وقوستەنتینیەو گەروەکان ،مادەی 62-64 سەبارەت بە کوردستانە ،لە مادەی 65 تا 83 سەبارەت بە سمیرنایە ، لەمادەی 84 تا 87 سەبارەت بە سنورە لەگەل یۆنان، لە ماددەی (88 هەتا 93) سەبارەت بەئەرمینیا ،لەمادەی (93 -121 بۆ وولاتانی عربی ) -سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی 94 هەتا 97. ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (95). حیجاز بەپێی ماددەکانی (98-99). بەو شێوەیە میسر لەمادەی (101). سودان لە مادەی (113).* مەغریب و تونس لە ماددەی (118). لیبیا بە ماددەی (121).

لە 122تا132 مەرجەکانی هاوپەیمان سەبارەت بە دابەشی میراتی عوسمانی،لە مادەی 132تا 140 ودەستبەرداری عوسمانیە لە ویلایەتەکانی پیشووی ،لە مادەی 141 تا151 سەبارەت بە کەمایەتی ئاینی وڕەگەزیە ، لەماددەی (152) هەتا ماددە (164) سەبارەت بە دیاریکردن و سنوردانان بۆ قەبارەی هێزی چەکداری تورکیا لە هەردوو بەشی دەرەك و سوپا، بەجۆرێك سوپای تورکیا لە 50.000 کەس تێنەپەڕی وەك لە مادەی (155) و (164) هاتووە ،تەنانەت ژمارەی

پاسەوانانی سوڵتانیش دیاریکراوە. لە ماددەی (165) هەتا ماددەی (169) هەر درێژکراوەی بەشە عەسکەریەکەی تورکیایە و باس لە چۆنیەتی دارشتنی پەیرەوی ناوەخۆ و بەرپا کردنی هەردوو جۆری سیستەمی (تەجنید) و (خۆبەخش) بۆ هەموو لایەك.ماددەی (170): سەبارەت بە باج و گومرگە بۆ تورکیا.لە ماددەی (171) هەتا ماددەی (176): سەبارەت بە چەك داماڵینی هێزەکانی تورکیایە و تەسلیمی بە هاوپەیمانان دەکاو لە کارگەکانیش نابێت چەکی قەدەغەکراو دروست بکا و ئەو جۆرە کارگانە بکا بە کارگەی بازرگانی، هەروەهاش کرینی چەکیشی بۆ دیاری بکرێ.ماددەی (177) هەتا (180): سەبارەت بە چەك داماڵینی و هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگای سەربازی تورکیا لەسەر دەریا و سنوری ئاسیاوی و ئەوروپیەکەی.لە مادەی (181-190):بۆ داماڵین و سنوردارکردنی چەکی دەریاییە لەبەلەم و غەواسەو کەشتی گەورە، دروستکردن و بەکارهێنانی بێ تەلیش دەگرێتەوە. لە ماددەی (191 هەتا 195): سەبارەت بە چالاکی ئاسمانیە لە فرۆکەو کۆپتەر و تیایدا هاتووە فرۆکەکانی هاوپەیمانان بە تەواوی ئاسمانی تورکیا دەسورێنەوە هەتا هێزە هاوپەیمانەکان لە تورکیا دەردەچن و لەو ماوەیەش جموجۆلی ئاسمانی تورکیا و بەهێزکردنی دەوەستێ بۆ ماوەی شەش مانگ.لە ماددەی (196-199):هەر لە بارەی دانانی چاودێریە لە بارەی ئەحکامەکانی سەروو بۆ چەك کردنی سوپای تورکیا.ماددەی (200-205)بۆ چاودێری هێزی سەربازی تورکی و زانیاری پێدانە بۆ جۆرەکانی چەك لە وشکایی و دەریایی و ئاسمانی سوپای تورکیا بۆ بە ئەندازەی ئەو هەرێمەی بۆی دەمێنێتەوە. لە ماددەی (206 تا 268 ئەحکامی گشتی وسزاو قەرەبوو، پەیماننامەکان ماددەی (269 هەتا 280): موڵکی پیشەسازی ماددەی 281 تا 286: موڵکیەت و ماف و بەرژەوەندی تر ماددەی (287-303): گرێبەستەکان: ماددەی (304-309): کۆمپانیاو ئیمتیازەکانی ماددەی (310-317):ئاسمانیماددەی (318-327) ماددەی (328 تا کۆتایی ماددەی 443): دەربەند و بەندەر و سکەی ئاسنی و مافە گشتی و جۆربەجۆرەکانی تر[1384].

---

[1384] سودی ڕاستەوخۆ لە کتێبی( دەقەکانی سیڤەرو خویندنەوەیەکی تر) وەرگیراوە .

## کاریگەری– چاکی وخراپی ئەو کۆنگرەیە

چاکی وخراپی رێژەییە لە چاو ئەنجامی جەنگ و ڕەهەندی ئاینی ورەهەندی نەتەوەیی ،کۆمەڵێك خالی چاکی تێدایە بۆ کورد بە تایبەتی بۆ بارودۆخی ئیستای ،ڕەنگە بۆ ناوچەکەو تورکیا وا نەبێ ، ڕەنگە ئەو چاکیە بۆ دۆخی خراپی ئیستای باش بێت مەرج نیە بۆ پیشووتر وابێت ،واتە لە چاو بارودۆخی میژووی کورد ئەوەندە باش نیە ،بەکورتی کاریگەریەکانی بریتین لە چاکی وخراپیەکانی ، چاکیەکانی ئەوانە بوە :

1- گرنگی خودی سیڤەر لەوە دێت کە وڵاتانی ئیستای رۆژهەلاتی وناوەڕاست وڵاتانی ئەوروپی ڕۆژهەڵاتیش هەر بە سیڤەر دروست بوون.
2- کۆتایی بە خەلافەتی عوسمانی دەهێنی وئەو بەش بەشیەی لە سایکس پیکۆ دیاری کرا لەگەل هەندێ هەمواری تر لە سیڤەر بەرجەستە بوو ،سیستەمی ئیمپراتۆریەتی نەهیشت ولە جێی کۆمەلێك دەولەتۆکەی لێ دروست بوو .
3- لە سایکس پیکۆی 1916 ویلایەتی موسل کەوتبوە بەر زۆنی فرنسا بەلام لە سان ریمۆی 1920 بریتانیا سەودایەکی لەگەل فرنسا کردو ئەو ویلایەتەی لێسەندەوە ،لە سیڤەر درایە کوردستان ،دوای بە هۆی کۆنگرەی لۆزان و ئەو لیژنە دەولیەی بۆی تەرخان کرا بە یەکجاری لە بندەستی تورکیای دەرهێناو گەڕایەوە سەر زۆنی بریتانیاو ئینجا عیراقیش.
4- ناوی عێراق لەو رێکەوتننە لە رێکەوتنەکانی تریش نەهاتبوو، زیاتر ناوی میزۆپۆتامیا هاتوە ، مێژونووسە عەرەبەکان تەرجومەی (میزۆپۆتامیای عەرەبی) بەعێراق دەکەن و سەروەرییەك بەناوی عێراق دەدەن، گوایە پێش ساڵی 1921 عێراقی سیاسی هەبوبێ، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانی ویلایەتێکیش نەبوو بەناوی عێراق، بۆیەلە رێکەوتننامەی سایکس-بیکۆش ئەو ناوچەیەبە پیت و رەنگی (A, B و رەنگی شین و سور) دابەشکران، هەرچی ناوچەکانی جزیرە و بۆتان (میزۆپۆتامیا) نێوان هەردوو زێی دیجلە و فورات تا بەغدا بە میزۆپۆتامیا هەژمار

كراوه[هىسمتر] واته بەغداو دەوروبەریشی ڕەهەندو ناوی كوردی بەسەر زاڵ دەبێ ، بۆیە ئەو جۆرە (وەرگێڕ)انە عیراقیان لە جیاتی میزۆپۆتامیا داناوە .

5-كوردستان و عێراق هەریەكە بە ماددەیەكی جیا لە عوسمانی جیابوەتەوە، كوردستان بە ماددەكانی (62، 63، 64)، هەرچی عێراق بەپێی ماددەی (94 ، 132)، ناوی كوردستان بە ئەدرەسێكی تایبەت لە بەشی سێیەم ولەماددەی (62) دا هاتووە بە ناوی (كوردستان)، لەپێش هەموو وڵاتانی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا) ، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە كە باری سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و... لە وڵاتانی تر پێگەیشتووتر بووە، .

6-سنوری كوردستان بەپێی ماددەی (62) دیاریكرابوو كە دەكاتە خوارووی سنوری توركیا و ئەرمینیا و رۆژهەڵاتی فورات، ئەو سنورەش تاڕادەیەكی زۆر گوزارش لە سنوری راستەقینەی كوردستان دەكات كە لە نەخشەی عوسمانی 1893 و (معجم البلدان، سیاحەتنامە و ئەنسیكلۆبیدیای عوسمانی و زۆر سەرچاوەی تر)هاتبوو ،دەردەكەوێ ویلایەتی موسڵ و بەسەدان كیلۆمەتر لە خوارووی موسڵ و كەركوك كوردستانی بووە*.

7- زۆر بڕگەی وای تێدایە كە دەبێتە زانیاری گرنگ بۆ ئەو سەردەمە ،لەوانە :

أ- بە ئاسانی دەردەكەوێ كە ئەو جینۆسایدەی دژ بە ئەرمەنی كرا نە كورد بووە نە عوسمانی، بەڵكو ئیتحادالترقی بووە، كە دوایی ئەو توركیایە نوێیەی لێدروست بوو، لەمادەی (142)ی سیڤەر بەهۆی كوشتاری ئەرمەن و بەشداری جەنگی جیهانی دەسەڵاتی ئیتحادیەكان بە (تیرۆریست) تۆمار دەكا، ئینجا قەرەبۆش دەخاتە ئەستۆی، هەر هەموو ئەوانە لەمادەكانی (231-257) سیڤەر- سەبارەت بە توركیا هاتوە.

ب- ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی ئیستا بەو رێكەوتن و كۆنگرە و مادەكانی سیڤەر دروستكراون، بەهەمان ماددە و رێكەوتن ئیسرائیلیشی پێ دروستكرا (لە ماددەی (95) باس لە جێبە جێ

---

[1385] الإسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة ص196 هەروەها بڕوانە نەخشەی سیڤەر. هەروەها بڕوانە: عبداللة ئۆجەلان – من دولة الكهنة السومرية الى الحضارة الديمقراطية ص352

* لە قاموس الاعلامی عوسمانی دەڵێ تەواوی ناوچەی موسل سەر بەهەرێمی كوردستانن بە عەرەبەكانیشەوە، باسی ویلایەتی موسل بە ویلایەتی موسلی كوردستان دەكا، باس لە كەركوكیش دەكا دەڵێ شارێكی كوردستانیە و4/3ی كوردن، ئەوەی تریشی تورك وعەرەبن، 760 ئیسرائیلی و460كلدانی لێیە.

کردنی بەڵێنی 2/ تشرینی/1917 دەکا)، لەراستیدا ماددەی 95 خوردکردنەوەی دەقی بەڵێنی بەلفۆرە، هەرچەندە لە رێکەوتننامەی سیڤەر ناوی بلفۆر و دەوڵەتی ئیسرائیلی تێدا نەهاتوە .

خراپییەکانی ئەو ڕێکەوتنە

وەك ناوچەکەو خەلافەت وتەنانەت عەرەب وتورك وعەجەم زیانیان بەر کەوت ، بۆ کوردیش ئاوانیە تا بەستنی کۆنگرەی سیڤەری 1920 ئەو ماددانە ئەوەندە گرنگ نەبوون بۆ کورد، چونکە مێژووی سیاسی کورد لەو مادانە زۆر گەورەترە، لەو کات و پێش ئەویش لە بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی* لە شێوەی وولاتانی کۆنفدرالی، لە رێکەوتننامەکانی عوسمانی و کوردا لەسالآنی 1912-1920دووبارە مافی سەربەخۆیی کوردستان بەتەواوی هاتبوو لە ڕێکەوتنێکی نێوان نوێنەرانی کورد کەپێك هاتبوو لە: عبدالقادر شمزینی (سەرۆك)، ئەمین عالی بدرخان، مراد بدرخان، مەولان زادە رفعت بەگ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە: دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الإسلام صبری زادە(سەرۆك)، ئەحمەد عبوق پاشا، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی[1386]. لە هەموو ئەو رێکەوتنانە کوردستان سەربەخۆیی پێدرابوو، سوڵتانی عوسمانی بەفەرمی دانی بە دەسەڵاتی شێخ مەحمودیشی هێنا بوو لەساڵی 1917وە، بۆیە ئەو مادانەی سیڤەر لەچاو باری سیاسی کورد ئەوکات و پێشوتر ئەوەندە گرنگ نەبوو، واتە خێری پێ نەکرابوو لەو مادانە، بەڵام لەدوای ئەوەی کوردستان بە گەلەوە دابەش و بێبەش کرا، ئینجا هەموو ئەو ڕێکەوتنانە بوونە سەنەدی یاسایی بۆ کەمێك لەمافەکانیان، هەتا سایکس-بیکۆش چەندە سەلبیە کەچی بۆ باری ئێستای سود مەندە وەك سەنەدێکی یاسایی نێو دەوڵەتی بۆبناغەی بە فیدراڵی بوونی هەرێمی کوردستان، بەو مەرجەی ئەگەر یاساناسێکی وریا و زیرەك هەبێت.

---

* ئەو جامیعەیە لەلایەن (سوڵتان عبدالحمید، جمال الدینی ئەفغانی، شێخ سعید نورسی، ابو الهدی الرفاعی، الشیخ محمد الظاهر، الشیخ اسعد قیصلی، ...) دروستکرا.

[1386] د کمال مظهر (کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الأولی) ص343، هەروەها (کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الأولی الی نهایة مشکلة الموصل) —سروة اسعد صابر

لەسەر ئەو بنچینەیە ناوبانگی سیڤەر وا بە باشی دەنگی دایەوە تا ئەو رادەیەی خەڵکی ناوی (سیڤەر) لە منداڵ و دوکان و بازاڕ بنێ، ئەگینا لەچاو ئەوسا دیسان سەلبیاتی زۆربووە، بەپێچەوانەی ڕای زۆر لە نوسەر و مێژوونوس و تەنانەت لە بەیانی فیدراڵی پەرلەمانیش کە لە 1992/10/4 دەرچوە، وەسفی سیڤەر دەکاو دەڵێ هەموو بەشەکانی کوردستانی یەك دەخستەوە، دەبینین ئەو بۆچونە هەڵەیە:

1- سیڤەر کوردستانی یەکنەخستەوە، جارێ بەلای بەشی کوردستانی رۆژهەلاتدا نەچووە کە لەژێردەستی ئێران بوو، هەروەها بەری ڕۆژئاوای فوراتی نەدەگرتەوە کە ئێستا کەوتۆتە ژێردەستی سوریا، بە مەبەستی ناڕەزایی دەربڕین لە دابەشی کوردستان (کۆمیتەی ناوەندی کۆمەلەی کورد) لە 1/28 /1920 ناڕەزایی بۆ کۆمیسیۆری بەرزی حکومەتی بەریتانیا ناردووە[1387]، هەروەها چەند لایەنێك لەوانە حزبی دیموکراتی کوردی ئەوسا (لە باکوور) لەگەل لیژنەی (کنگ-کراینی) ئەمریکی دانیشت بۆ ئەو مەبەستە.

2- بەشێکی گرنگی لە خاکی کوردستان بەپێی مادەی 89 لە ویلایەتەکانی ئامەد و بتلیس و وان دایە ئەرمینیا کە جار وایە هەندێ مێژوو نوسی کورد بە (پەیمانی بلفۆر)ی ئەرمەن وەسف دەکرێ، پیشووتر ئەرمەنەکان بە پشتیوانی روسیا ولایەتەکانی (ئەرزەرۆم ودیاربکروسیواس وخارپووت وبەتلیس و ڤان)یان دیاری کردبو بۆدەولەتیکی ئەرمەنی[1388]،دوایش لە لائیحەی (پرۆژەی چاکسازی روسی)هەمان بیرۆکە هاتبوو بەناوی (پرۆژەی پورتقالی ژ:50) کە لەمادەی یەك گوزارش کرابوو[1389] ،ئەو پرۆژەیەی روسی لە1913/6/8 بۆ چاکسازی باری ئەرمەنی لە وولاتی عوسمانی جاڕدرا، پیکهاتبوو لە 22مادە (هەر مادەیەکیش لە شێوەی پاکیج دروست ببوو ) ، لەمادەی یەك ولایەتەکانی (ئەرزەرۆم-وان-خەرپووت – پەتلیس – ئامەد – سیواس )بۆ وولاتی ئەرمەنی دیاری

---

[1387] بڕوانە دەقی نامەکە لە ل109ی کتێبی (کۆمەلەو ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەلگەنامەکانی بریتانی و فرنسی) .

[1388] مذکرات جمال باشا -اعداد:محمدالسعیدی ج1ص428-429

[1389] ئەو پرۆژەیە لە1913/6/8 دەرچوە پیکهاتوە لە 22 مادە بە (الکتاب البرتقالی رقم 50)ناوزەد دەکرا بۆ چاکسازی باری ئەرمەن لە عوسمانی .

کرابوو ،له مادەی(2) والیەکی ئەرمەنی لەسەرووی هەر ویلایەتێك بێت ،لەهەمان کات سەرۆکی تەنفیزی ئەنجومەنی ئەو ویلاتەش دەبێت ،لەمادەی (5)ژمارەی ئەرمەن وموسولمان لەئەنجومەنی ویلایەت یەکسان بن ، لەمادەی (15) داکۆکی لەوە دەکا هەر فەرمان وبەیانێك بەهەر(3)زمانی (ئەرمەنی وکوردی وتورکی)بێت [1390] ،،دوای بەشێك لەو چاکسازیە بوە ڕێکەوتنێکی روسی وعوسمانی بە مۆری(سعیدحلیم پاشای سەدری ئەعزەم وسەرکۆنسۆلی روسی (گۆلگڤیتچ) لەرۆژی 26/کانونیدوەمی 1914، دواجار ئەو پاکیجانە لەمادەی 89ی سیڤەر خەملی . هەرچەندە ئەوناوچانە کوردستانین(بەلام ئەرمەنیشی بەشیوەیەکی فراوان لیبوە)هەتا ئەرمەنییەکانیش دەزانن، بۆیە لەپەرەگرافی(ب)ی مادەی (2)ی ڕێکەوتننامەی ساڵی 1927/10/29 بزوتنەوەی تاشناقی ئەرمەنی و بزوتنەوەی (خۆیبون)ی کورد هەڵوەشێنرایەوە*،... بەو شێوەیە لە سیڤەریش کوردستان کرایە (6) پارچە، بەڵام پارچە سەرەکیەکە وەك خۆی مایەوە .

3- نوێنەری کورد لەو ڕێکەوتنامەیەدا نەبوو، لەکاتێکدا نوێنەری ئەرمینیا وحیجازی تێدا بوو، بەڵام نوێنەرانی عێراق و سوریا و باقی وڵاتانی عەرەبی(پیشنیارکراو) تێدانەبوو، بوونی وەفدی عوسمانی لەلایەك و لەلایەکی تر تێڕوانینی ستراتیژی ئەوسای هاوپەیمانان هۆیەکی گرنگ بوو کە سیڤەر ئەو رەوتەی وەرگرت، ئەگینا نە نوێنەری کورد لەو کۆنگرەیە بەشداربوو نە دۆستێکیش، بە پێچەوانەی ڕای بەشێك لە میژوو نوسانی کورد کە دەڵێن شریف پاشا بەشدار بوو لەو کۆنگرەیە بۆیە مادەی باشی تێکەوت، نەخێر ئەوکاتە (شەریف پاشای دیپلۆماسی کورد) تووڕە ببوو بەقسەی (کریس کۆچیرا) لە ڕقی ئەوەی بەشێکی کوردستان درابوە ئەرمەنەکان ئیستقالەی دابوو لە 1920/4/27وە [1391].

---

[1390] ئەو پرۆژەیە لە1913/6/8 دەرچوە پیکهاتوە لە 22 مادە بە (الکتاب البرتقالی رقم 50)ناوزەد دەکرا .

* ئەو ڕێککەوتنە پێك هاتبوو لە 19 مادە بە مەبەستی هاوپەیمانی نێوان کوردو ئەرمەن.

[1391] القضية الکوردية فی المؤتمرات الدولية.هەروەها لە (کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بریتانی – د کمال مەزهەر)دا هەمان بەرواری ئیستقالەکەی دیاری کردوە.

4- سەبارەت بە دەوڵەت بوونی کورد باس لەماوەی (6مانگ) بۆ لیژنەی (3) قۆڵی بەریتانی، فرنسی، ئیتالی، و دوای سالێك راپرسی دەکا[1392]، لەکاتێکدا بۆ وڵاتانی تر ئەوەی پێویست نەبووە، بۆ ناوچەی (سمیرنا) ئەزمیری ئێستا لەو شێوەیە بوو، کەچی تا ئەو شەش مانگ و لیژنانە هاتە کایەوە دەسەڵاتی عوسمانی نەما و دەسەڵاتی ئەتاتورك هات و شکستی پێهێنا.

5- لەدوای ئەو رێکەوتنامەیە لە کۆنفرانسی لەندەنیش ئەو خاڵانەیان باس نەکردەوە دواییش پابەند نەبوون پێیەوە، تەنها ئەوەندە نەبێ بەو هۆیەوە چەرچەڵ لە کۆنگرەی قاهیرە 1921 لکاندنی باشوری کوردستانی کەمێك دواخست، دواییش چەرچڵ لە حکومەت نەما.

6- دەبێ لەیاد نەکەین هەموو ئەو زنجیرە کۆنگرانە کە لە کۆنگرەی سایکس-بیکۆ تا لۆزان بۆ دابەشکردن و لاواز کردنی دەوڵەتی عوسمانی و لەناوبردنی خەلافەتەکەی و دواخستنی ناوچەکە کراوە، کوردیش بەشێکی ئەکتیڤی ناوچەکە بووە، بەڵام بەهۆی ئەو بارودۆخە سیاسیەی کورد تێکەوت، ئەو زیانە گشتیانەی لەبیر چووە لەبەر ئێش و ژانی تایبەتی خۆی، هەر لەو زنجیرە کۆنگرانەش بوو کوردستان دابەشکرا.

7- ئەو لیژنانەی لە مادەی (62) پێشنیارکرا دەست بەکار نەبوون، راپۆرتی داواکاری کوردەکان لەماوەی سالێك نەدرا بە (عصبە الامم)، لە بەڵگەنامەکانی (عصبە الامم) کە لەبەردەستدایە تەنها ئەو داواکارییەی 1925/12/16 لەو سەردەمە کەمتر پالپشت کراوەتە سەر مادەکانی سیڤەر، لەلای کورد دەنگ و سەدایەکی زۆری نەبووە.

8- هەروەك لە مادەی (62) هاتووە بۆ لادانی هەر ئاستەنگێك لەبەردەم پەیڕەوکردنی ئەو مادانە وا بڕیار بوو هەرسێ لایەنی (بەریتانیا و فرنسا و ئیتالیا) راپۆرت بەرز بکەنەوە بۆ دەوڵەتەکەیان.. ئەوەشیان نەکرد.

---

[1392] بڕوانە مادەی 62 و 64ی سیڤەر

9- هەر (5) مانگ دوای سیڤەر و مانگێك پێش کۆنگرەی قاهیرە برسی کۆکسی (حاکمی بەریتانیا لە عیراق) بەنوسراوی فەرمی ژ:4/3330ی 1921/2/22 دەنێری بۆ حکومەتی تازەی عیراقی و فەرمانیان پیێ دەکا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عیراق.

10-ئەوەی زۆر گرنگە بووتریێ دەبینین لەمادەی (27)ی سیڤەر خۆی سنوری نێوان تورکیا و میزۆپۆتامیای عەرەبی (عیراقی ئیستا) دیاری دەکا وەك ئەوە وابێت کە مادەی 62 هەر بوونی نەبێت سەبارەت بە سنوری کوردستان.

## ڕەهەندی کورد لەو ڕێکەوتنامەیە

کوردستان دوەم ئەدرێسی سیڤەر بوو لە زنجیرەی دەوڵەتانی پێشنیارکراو، گرنگییەکی زۆری پێدرا بوو، هەندێك بۆ ئەوەی دەگێڕنەوە گوایە ئەوکاتە (شەریف پاشای دیپلۆماسی کورد)  بەشدار بوە ،ئەوە ڕاست نیە ،ئەو کاتی توورە ببوو(وەك کریس کۆچیرا دەلێت) لە ڕقی ئەوەی بەشێکی کوردستان درابوە ئەرمەنەکان لە1920/4/27وە ئیستقالەی دابوو [1393]، قۆناغەکانی بە دەوڵەت بوونی کوردیش لە سیڤەر هەمان قۆناغی سەرکردەکانی کورد پیشنیاریان کردبوو[1394]،هەمان ئەو ڕاستیە لە بەلگەنامەکانی بریتانیش بەدی دەکریێ :(من أدمیرال دی روبیك -استنبول 18 نیسان/1920 برقیە رقم/ 401الی \ وزارە الخارجیە ) .

بۆ یەکەم جاریش سنوریکی نیو دەولەتی بۆ کوردستان دیاری دەکریێ بە پێی مادەی (62)، کوردستانی خوارووشی دەگرتەوە هەروەك لە ماددەی (64) زۆر بەڕوونی ئاماژە بە ویلایەتی موسڵ دەدا و دەڵێ هێزەکانی هاوپەیمانان ڕێگری ناکا لە تێکەڵ بوونی کوردستانی بەشی ویلایەتی موسڵ بۆ ئەو دەوڵەتەی کوردستان .

لەلایەکی تریشەوە ئەو ئۆتۆنۆمیەی لەمادەی 62 دەڤەری هاتبوو، هەمان ئاستی یاسایی وولاتانی تری ناوچەکەی هەیە ، ئەو ولاّتانەی بڕیاری جیاکردنەوەیان درا لە ماددەی 94 یەکسەر بە

---

[1393] القضیة الکوردیة فی المؤتمرات الدولیة.هەروەها لە (کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بریتانی — د کمال مەزهەر)دا هەمان بەرواری ئیستقالەکەی دیاری کردوە.

[1394] بڕوانە دەرسیم لە میژووی کورد- بەیتار دەرسیمی ل145 و 146

دەوڵەت بوون نەبوو، نە ئۆتۆنۆمیش بوو، لەوانە کەمتر بوو، بەڵکو کەوتنە ژێر سیستەمی ئینتداب*،
دابەشی ئیستعماری بوو لەنێو خۆیان، کە لە پەرەگرافی (4) ودیباجەی ماددەی (22)ی کۆمەڵەی
نەتەوەکان وەسفیان دەکات و دەڵێت: میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا
تادەگاتە ئاستی دەولەت، بە هەمان شێوەش چەکی ئینتدابەکان بە ناوی بەرەو ئۆتۆنۆمی هاتبوون
ڕاستەوخۆ وەك مادەی (3)ی ئینتدابی بەریتانی بەسەر فلستین[1395] یان ناڕاستەوخۆ لەوانی تر، بەڵام
ئەو وڵاتانە ئەوانەن کە لەژێر دەستی وڵاتێکی هاوپەیمانی دیاریکراو بوون، کوردستان بەتەواوی لەژێر
دەستی هیچیان نەبوو ، ئۆتۆنۆمی ئەوسا لە فەرهەنگی یاسایی و سیاسی ئەو سەردەمە مانای
(ماوەی گواستنەوە بۆ سەربەخۆیی)[1396]داوە، هەروەك لە خالی (12)ی بنەماکانی ویلسۆن
(ئۆتۆنۆمی) لە جیاتی مافی چارەنوس بەکارهێناوە، هەر بەپێی مادەی (113)ی سیڤەر بوو سودان
سەربەخۆیی وەرگرت لە 1952/2/22 لە سەر بنچینەی ئەو ئۆتۆنۆمیە، لەفەرهەنگی کۆنگرەی
سان ریمۆش دەولەتی سەربەخۆو ئۆتۆنۆمی یەکسان کردووە، هەرچی ئۆتۆنۆمی ئێستایە بچوکترە لە
فیدراڵی و مانای مانەوە لەژێر سیستەمی ئەو دەوڵەتە لە چوارچێوەی (لامرکزی)، لە سیڤەریش ئەو
ئۆتۆنۆمیە بۆ ماوەی ساڵێك بووە کە پێی وتراوە ئۆتۆنۆمی دەڤەری بەرەو ئۆتۆنۆمی نێودەوڵەتی
(سەربەخۆیی تەواو).

**سەرەنجامی ماددەکانی (62-64) :** سێ مادەکەی سیڤەر لە بەشی سێیەم هاتبوولە مادەی 62
و63 و64 ،**دەقەکەی:** ماددەی (62): لیژنەیەکی سێ قۆڵی پێك دێت بارەگاکەی لە ئەستەمبۆل دەبێت، ئەو لیژنەیە
لەلایەن بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و نوێنەری کورد دروست دەکرێت بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکی دەڤەریی بۆ ناوچە
کوردییەکان لەدوای شەش مانگ لە مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیە، سنوری ئەو ناوچەیەش بریتییە لە رۆژهەڵاتی فورات، و باشوری
رۆژئاوای سنوری ئەرمینیا کە لەدوای ئەوەش دیاری دەکرێ، لە سەروی سنوری تورکیا و سوریا و میزۆپۆتامیا کە لە پەرەگرافی
(2)ی ماددەی (27) دەستنیشان کراوە، ئەگەر لەکاتێکیشا ئەو لیژنەیە لە هەر مەسەلەیەك نەگەیشتنە ئەنجامێك ئەوا هەریەکە
راپۆرتی خۆی لەو مەسەلەیە دەداتەوە حکومەتەکەی، لەو پرۆژەیەدا پێویستە رەچاوی تەواوی مافەکانی رەگەزی و ئایینی کلدان و

---

* لە ڕاستیدا سیستەمی ئینتداب جیا بوو لە بنەماکانی مافی چارەنوس کە لە جامعەی ئیسلامی و دوای لە 14 بنامایەکەی ویلسون ولە جاڕنامە هاوبەشەکەی فرنسی وبریتانی هاتبوو، بەلکو ئینتداب جۆرێکی تر بوو لە دابەشی ئیستعماری، ئەوەش هۆیەکی تر بوو کە کۆنگریسی ئەمریکی قایل نەبوو ئەرمینیا وەرگرێ وەك ئینتداب.

[1395] بڕوانە دەقی چەکی ئینتدابی فەلەستین کە لە24/یۆلیۆ/1922دەرچوو، 28 مادە بوو.

[1396] بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە مەوسوعە و فەرهەنگی ئەو سەردەمە تا شەستەکانیش هەروابوو، بڕوانە (القاموس السیاسی) ساڵی 1968، د.احمدعطیة اللة ص472-473

ئاشور و کەمایەتییەکانی تری (نەتەوەیی) و (مەزەبی) بکرێت لەنێو ئەو سنورەی لە سەروو دیاریکرا، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەیەکی تری پێکهاتوو لە بەریتانی و فەڕەنسی و ئیتالی و فارسی و کوردی سەردانی مەیدانی دەکەن بۆ هەر دەستکارییەك ئەگەر پێویست بکات لە سنورەکانی تورکیا، لەبەر ئەوەی ئەو سنورە لەژێر مەرجەکانی ئەو پەیماننامەیە تا سنوری فارس.

مادده (63): لەوساتەوە حکومەتی عوسمانی تورکی پەیمان دەدا بە قایلبوونی بەو بڕیارانەی کە لە هەردوو لیژنەی ئاماژەپێکراو لەماددەی (62) هاتووە وا لە ماوەی (3) مانگیش جێبەجێیان دەکا، لە دوای جاڕدانی.

ماددەی (64): لەدوای سالێکی تر ئەگەر زۆربەی گەلی کورد کە لەو سنورەی لە ماددەی (62) دیاریکرا داوای سەربەخۆییان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبه الامم) کردو بیانەوێ لە تورکیا جیاببنەوە، کۆمەڵەی نەتەوەکانیش زانییان ئەوانە دەتوانن ئەو سەربەخۆییە بەڕێوە ببەن و راسپێری بکەن، ئەوە دەبێت تورکیا دانیان پێدا بێنێ و لە هەموو مافەکانی خۆی لەو ناوچانە دەستهەڵگرێ، وردەکاری ئەو دەستهەڵگرتنەش بابەتی رێکەوتنێکی تایبەتی دەبێ لەنێوان وڵاتە هەرەگرنگەکانی هاوپەیمانان و تورکیا، ئەوکاتەش هێزە سەرەکیەکانی هاوپەیمانان هیچ رێگرییەك ناکەن لە تێکەڵبونێکی ئارەزومەندانەی ئەو بەشە کوردستانەی لە ویلایەتی موسڵە بۆ ئەو دەوڵەتە کوردیە سەربەخۆیەی دروست دەبێ.

وەك ڕوونە ئەو 3 مادەیە جیبەجێ نەبوو ،ئەوەی لەو ڕێکەوتنامەیەە بەباسی جێبەجێ نەکرا بەشی سێیەمو بەشی شەشەم بوو (سەبارەت بە کوردستان و ئەرمینیا) بەلام ئەوەی کوردستان زۆر خراپتر ،بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەو 3 مادەیە لەژێر سایەی ریکەوتنی لۆزانی 1923 بزر کرا.

بەشێك پێیان وایە بەریتانیا هەر لە بنەچەدا باوەڕی بەو مادانەی (62، 63، 64) نەبووە[1397]، د کمال مەزهەریش دەڵێ ئەو ڕۆژەی جاڕی پەیماننامەی سیڤەر درا بریتانیا و فرنسا و ئیتالیا کۆببونەوە بۆ دابەش کردنی کوردستان،با بزانین هۆیە ڕاستەقینەکانی جێبەجێ نەبوونی سیڤەر چی بوو:

1- باوەڕی ڕۆژئاواو مەدرەسەی لیبرالی بە ڕێکەوتن وبەلێن وەك بەشێك لە پرۆسەی پراگماتیکی سەیر کراوە نەك ئەخلاق وپیرۆز.
2- سەرکەوتنی ئەتاتورك وئەنقەرە و مدرسەی عەلمانی بەسەر سولتان و ئەستەمبۆل ومدرسەی ئیسلامی، لەولایەش سەرکەوتنەکانی لە هەردوو بەرەی جەنگی رۆژئاواو خواروو.
3- گۆڕانی حکومەتی بەریتانیا (چەرچل) بە محافزین، ئەتاتۆرك بە سولتان، لە ئیتالیا و

[1397] سیاسة البریطانیة العظمی تجاه مستقبل کردستان ص226.

فرنساش گۆڕان بوو.. هەموو ئەوانە لە قازانجی پێشهاتەکانی نوێی تورکیا بوو.

4- رێکەوتنەکانی ئەتاتورك لەگەڵ روسیا و فەڕەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا.

5- نەگەیشتنی هێزەکانی هاوپەیمانان بۆتەواوی کوردستان.

6- چاوتێبڕینی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ و سازشکردن لەسەری.

7- بەشێکیش دەکەوێتە ئەستۆی کورد خۆی و بەشێکیش لە ئەستۆی ساغ نەبونەوەی مادەکانی سیڤەرە.

8- ئەمریکاو باقی وولاّتانی تر زۆر سور نەبوون لە سەر جێ بە جێ کردنی سیڤەر و دەیان گوت هەمووی لە قازانجی بەریتانی داڕێژراوە، تەنانەت ئەمریکا لە 14 بنەماکەی (ویلسۆن) یش پەشێمان بۆوە سەبارەت بە مافی چارەنووسی میللەتان، هەروەها فرنسا و بریتانیاش لە لێدوانە هاوبەشە بەناوبانگەکەی ڕۆژی1918/10/7 سەبارەت بە مافی چارەنووس پەشێمان بوونەوە، فرنسا یەکەم وولاّت بوو شکۆی سیڤەری شکاند و دانی بە تورکیای نوێ هێنا، دوای ئەو ئیتالیا بوو، روسیای بەلشەفیش پشتی ئەتاتورکی گرت و یەکەم کۆبونەوەیان لە1919/6/21 لە نێوان ئەتاتورك وسیمن بودێنی گرێدرا بۆ یارمەتی سەربازی تورکیا .

<u>حوکمی قانونی سیڤەر</u> : بەو شێوەیە زۆربەی مادەکانی تری سیڤەر جیبەجێ بوو کەچی بۆ کوردو ئەرمەن جیبەجێ نەبوو ، ئیستا زاناو یاساناسی کورد بەدوای ئەو پرسیارەن ئاخۆ سیڤەر لەرووی یاساییەوە هەڵوەشاوەتەوە؟ ووردتر ئەو 3 مادەیە لە ڕووی سیاسی هەلوەشایەوە ئاخۆ چەندە هێزی یاسایی ماوە ؟ زۆربەی لەسەر ئەو ڕایەی هنری بوانکاریەی سەرۆکی فرنسی ئەوسان کەووتبووی سیڤەر شکا وەك شکانی ئەو کاشی و فەخفوریانەی لە شاری سیڤەر دروست دەکرێ *،بەلام بەشیکی تر دەڵێن سیڤەر هەڵنەشاوەتەوە(بەتایبەتی لە ڕووی یاساییەوە)، پاساوەکانیان ئەوانەی خوارەوەیە:

1. پێناسی رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی رەگەزی (ئارزەوومەندانەی) تێدایە و لەوێش نوێنەری عوسمانی بە ئارەزووی خۆی دوای (2) ساڵ لە تەواو بونی جەنگ هاتووە و مۆری کردووە.

2. بەشی هەرەزۆری ئەو رێکەوتننامەیە جێبەجێ کراو وڵاتانی ناوچەکە لەسەر ئەو بنچینەیە

* شاری سیڤەر لە فرنسایەو ئەو کات بە دروست کردنی ئەو جۆرە کەل وپەلانە بەناو بانگ بوو.

دروستبووە،  تەنانەت ئیسرائیل[1398] لە 1948 و سودان و لیبیا لە 1952 بەپاڵپشت بە سیڤەر سەربەخۆییان وەرگرت واتە 32 ساڵ دوای مۆرکردنی.

3. تورکیای نوێش بەپێی پەیماننامەی (فرانکلین-بۆیۆن) دانی بە سیستەمی ئینتداب نا کە لە سیڤەر دروست بوو، ئینجا تورکیا خۆی بە میراتگری عوسمانی هەژمار دەکا بۆیە داوای ویلایەتی موسڵی کردەوە، ئەوەش کۆمەڵێك مافی یاسایی دەخاتە ئەستۆی و لەپێش هەموان جێبەجێ کردنی تەواوی مادەکانی سیڤەر بە مادەکانی (62، 63، 64) یشەوە. لەکێشەی ویلایەتی موسلیش پاساوەکانی بریتانی و تورکیش هەر گەڕانەوە و پالپشت بوو بۆ ئەو ڕێکەوتنامەیە

4. مادەکانی (62، 63، 64)ی سەبارەت بە کوردستان نەك هەر (بەزۆری بوو یان بەزۆری نەبوو) بەڵکو لەوپەڕی ئارەزوومەندانە بوو، چونکە لەپێش سیڤەریش لە هەردوولای پەیماننامەکە ئەو بەندانەی تیا هاتبوو، لەلای عوسمانی ئەو مادانە بە دوو قۆلی عوسمانی و کوردی مۆر کرابوو ،لەلای هاوپەیمانیش: لە سەرەتای سەدەی 19 بەڵێنی وا هەیە، کۆنگرەی بەرلینی 1878*، کۆنگرەی پاریسی 1902/2/4 ، کۆنگرەی سان ریمۆی 1920، و لەپێش ئەویش لە کۆنگرەی ئاشتی لە30/ 1919/1 هاوپەیمانان و ولاتانی سەر بەوان ڕێکەوتن کە ئەرمینیا و کوردستان و میزۆپۆتۆمیا و فلستین ولاتانی عربیش لە عوسمانی جیا بکرێتەوە، لە سەر ئەو بنچینەیە شریف پاشا لە(1-21)/1920/3وەك نوینەری کورد دوو نەخشەی کوردستان پێش کەش بە کۆنگرەی ئاشتی کرد.

5. هیچ مادەیەك لە (لۆزان) ئاماژە بە هەڵوەشاندنەوەی سیڤەر ناکابەلکو پالپشتی دەکاتە سەر، ئەوەش بەلگەیە لە سەر قایلی تورکیا پێی.

6. لە کۆنفرانسی لەندەن کە لە (2/21 هەتا 3/12)ی 1921ی خایاند، بەریتانیا و هەردوو نوێنەری عوسمانی و کەمالی ئامادە بوون، تەنها نوێنەری کەمالی داوای هەموار

---

[1398] لە 1947/11/29بڕیاڕی ژ:181ی خولی (2)لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆدابەشی فلستین وبەرجەستەی ڕێکەوتنامەی سیڤەر.

* لایەنەکانی بەشداربووی کۆنگرە بریتی بوون لە: ئەلمانیا، بریتانیا، فرنسا، ئیتالیا، ، روسیا، پروسیا، مەجەر، عوسمانی.

کردنی سیڤەری دەکرد، بەڵام مۆرنەکرا لەلایەن نوێنەری عوسمانی، ئەو کاتیش هەر عوسمانی فەرمی بوون نەك کەمالی، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لەلایەن (عصبە الامم) نوێنەر دیاری بکرێ و بڕیارێکی یاسایشی لەسەرەتای ساڵی 1922 دەربکرێ و سەرنجی هێزەکانی هاوپەیمانانی راکێشا بۆ زامنکردنی مافی کورد کە لە سیفر هاتبوو.

7. هەر خودی (کۆمەڵەی گەلان) پالپشت بە سان ریمۆ و سیڤەر دروست بوو، دیباجەکەی مادەی 22 ی دیسان پشت بە سیڤەر دەبەستێ، دوایش نەتەوە یەکگرتوەکانیش بە دریژکراوەی یاسایی (کۆمەڵەی گەلان) هەژماردەکرێ .

8. لەدوای جەنگی جهانی دوەم بۆ سەربە خۆیی پۆلۆنیا پەیماننامە سەبارەت پاراستنی کەمایەتی لە 1945/6/28 بەسترا و پالپشت کرایە سەر مادەکانی 10 و11 ی ڤرسای کە هاوتای ئەو مادانە لەسیڤەر لەمادەکانی 140 تا150 هاتبوون.

هەمو ئەوانە بە ڕوونی دەری دەخا کە ڕێکەوتنامەی سیڤەر ئەگەر لە ڕووی سیاسی هەلوەشابێتەوە هیچ مادەیەکی ناکۆك نابینرێتەوە کە بیسەلمینیت لە ڕووی یاساییەوە هەلوەشابێتەوە ،بۆیە بۆ هەر هەنگاوێکی مافی چارەنوس بۆ هەمو پارچەکانی کوردستان پالپشتێکی یاسایی باش دروست دەکا ،چ لەسەر ئاستی ناوەخۆ چ لەسەر ئاستی دەولی .

(46)

## ڕێکەوتنامەی لۆزان      اتفاقية لوزان      The Treaty of Lausanne

ئەوانەش دەگریتەوە ( جامیعەی ئیسلامی ،برنجی زادە ،سەدری ئەعزەم، ڕێکەوتنی ئۆکی ،..)

ئەو ڕێکەوتنە دوا ئەلقەی خەملینی دیزاینی سنوری تورکیا لەگەل دراوسێیان و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە ،لە سالی 1923 بەسترا لەشاری لۆزانی سویسرە،قۆناغی یەکەم لە 1922/11/20 دەستی پێکرد چەندین هەورازو نشێوی بینی نەگەیشتنە ئەنجام ،لە 23ی ئیبریل/نیسانی 1923 جاریکی تر دەستی پێکردەوەولە24تموز/1924/7کۆتایی هات بە ریکەوتنی لۆزان،بە پێی( Encyclopædi Britannica ) حەفت مانگی خایاند[1399]،بۆیە جاروایە بەرواری جیاجیا بۆ ئەو کۆنگرەو ڕێکەوتنە تۆماردەکرێ ،بەلام بەزۆری بەرواری 1923 دیاری کراوە ، لە کۆپی ئینگلیزیە ڕەسەنەکەی ڕێکەوتنی لۆزان بەرواری (24J ULY 1923 ) لەسەرە .

جاریش وایە ڕێکەتنی لۆزانی دوەمی پێ دەووترێت ،چونکە ڕێکەوتنێکی تر لە لۆزان سالی 1912 گریدراوە لە نێوان ئیتالیاو عوسمانی بە دوو قۆلی-هەندێ جار پێی ووتراوە ڕێکەوتنی ئۆکی ،ئەوەی دوەم(لۆزان) لایەنەکانی ڕێکەوتن بریتین لە (بەریتانیا و فرنسا و ئیتالیا و یابان و یۆنان و رۆمانیا و سیرب و کرواتیا و سلۆڤینیا) ، لەلای تورکیاش عیسمەت ئینینۆی سەرۆك وەزیر سەرۆکی وەفد بوو ، تا گەیشتە رێکەوتننامەیەکی 143 ماددەیی، تیایدا کۆمەلێك خاك و ئاوی عوسمانی دۆڕاو ویلایەتی موسلێش کەوتە سەر عێراق، لە بەرامبەریشدا کۆمەلێك مادەی سیڤەر بووە قوربانی، لەنێویاندا هەر سێ ماددەی 62، 63، 64(بەشی سێیەم)سەبارەت بە کوردستان، هەروەها مادەکانی (88 هەتا 93)بەشی هەشتەم سەبارەت بە ئەرمینیا ،هەندێ مەرجی توندیش بەسەر تورکیا سەپێنرابوو لادرا ، ، بەتەواوی لە پەیامی عوسمانی دوورکەوتەوەو بەرپرسیاریەتی

---

[1399] Encyclopædia Britannica –Article: Treaty of Lausanne,

دەولەتۆکەیەکی تورکی لە ئەستۆ گرت لە جیاتی (ئەوەی پێی دەووترا دارالاسلام وئومەی ئیسلامی ) ، دان بە تورکیایەکی نوێ هێنرا بە پێوانەیی هاوپەیمانان، لەو رێکەوتننامەیە 128 جار ناوی تورکیا تیاهاتووە، بۆیەکەم جار ناوی عیراق دێت ،ناوی عیراق لەڕێکەوتنامەکانی پیشووتر نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی 1923 بۆ یەکەم جار ناوی عیراق دوو جار لە مادەی (3) هاتوە ، مادەی (3)سەبارەت بە سنوری لەگەڵ عیراق کە لەدوای بەناوی (کیشەی ویلایەتی موسل ) ناوزەد دەکرا، ناوی کورد و کوردستانی تیادا نەهاتبوو[1400].

لە یەکەم مادە بە ئینگلیزیە دەست پێدەکا ( PART I: POLITICAL CLAUSES)

تا دوامادەی 143 کە بریتیە لە ( ARTICLE 143. The present Treaty shall be ratified as soon as possible.)

لای تورك مۆروئیمزای عصمت ئینینۆ و دووکەسی تری لەسەرە بەناوی (د رەزانوور) و(حسن بەگ) لەکۆتایی ڕێکەوتنەکە.

<u>**تورکیا لە سیڤەر و لۆزانەوە:**</u> لەو کات و ساتانەی مۆرکردنی سیڤەر(1920) بەدواوە کەمال ئەتاتورك وەك ئەفسەرێکی نیشتمانی بەهێز بەو واقیعەی عوسمانی تێکەوتبوو قایل نەبوو،زۆربەی وولاتی داگیرکرابوو ،هێزەکانی هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانی یەکەم گەیشتبوونە ئەستەمبۆل و سوڕابونەوە بۆ ئەنادۆل ، میراتی عوسمانی لە خاك وئاوو وهەوا دابەش کرابوو بە پێی سیڤەر ، بە تاکتیکاتی تایبەتی خۆی ئەتاتورك توانی دوو کۆنگرەی خۆ دروستکردنی ئەنجام بدا لەژێر پارێزگاری دەسەڵاتی عەشایەرە کوردەکان، یەکەمیان لە ئەرزەرۆم لە 1919/7/23 ، دووەمیان لە 4 ـ 1919/9/11 لە سیواس، ڕێکەوتنی سیواس بنەمای زۆر ترسناکی تیادا هاتبو، کە کوردستان بە تێکڕایی بەشێکی جیا نەکراوەی تورکیای نوێ بێت، بەو شێوەیە پاڵی دایە شاخەکانی کوردستان و ئەنادۆڵ و توانی سەرکەوتنی مەزن بەسەر سوپای یۆنانیەکان بەدەست بهێنێ، ناوبانگی پەیدا کرد،ڕووی لە بیناکردنی دەولەتیکی مۆدیرنی عەلمانی کرد ،یەکەم هەنگاوی لەجیاتی ئەستەمبۆل ئەنقەرەی کردە پایتەخت، کەواتە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم 1918 دوو دەسەڵات دروست بوو،

---

[1400] لە هەندێ سەرچاوە ئاماژەیان بە مادەکانی (38، 39، 40)ی لۆزان کردووە گوایە مافو ناوی کوردی تیاهاتووە، دوای ئەوەی بەوردی بەراوردمان کرد لەگەڵ دەقی رێکەوتننامەی لۆزان بە ئینگلیزیەکەی دەرکەوت ناوی کوردی تیا نەهاتوە.

یەکەمیان لە ئەنقەرە بە سەرۆکایەتی مستەفا ئەتاتورك و سەرۆك وەزیرانی (عصمت ئینینۆ) ئاراستەیەکی عەلمانی گرتەبەر، دوەمیان لە ئەستەمبۆل بریتی بوو لە دەسەلآتی عوسمانی بە سولّتانیایەتی (محمد واحدالدین) و سەدری ئەعزەمەکەی (فەرید داماد پاشا)، یەکەمیان بەرەو بەهێزی ودوەمیشیان بەرەو لە ناوچوون، لەسەرەتادا ئەتاتورك گوتاری ئایینی بەکاردەهێنا، بەڵێنی درۆی بەکورد دا، نیازەکانی خۆی تا ساڵی 1924 بە تەواوی بەدەرنەخست، کە نیازی وایە کۆتایی بە خەلافەت بهێنێ و رژێمێکی عەلمانی توند لە دەوڵەتێکی مۆدێرنی تورکیا پەیڕەو بکا، تیایدا زمان و فەرهەنگی میللەتانی تری لێ قەدەغە بکات.

ئەو پیاوە جەماوەرێکی زۆری پەیداکرد ، جاڕیشیدا کە رێکەوتننامەی سیڤەر بۆ تورکیا مەرگە، بە هەموو شێوەیەك لەدژی وەستا، کەوتە دژایەتی سولّتانیش لە ئەستەمبۆل وبەخائن ناوی دەبرد ،چونکە (نوێنەری سولّتان -هادی پاشا) سیڤەری مۆرکرد بوو- بەلام لە (مذکرات جمال باشا)واهاتوە گوایە فریدپاشاو 4 وەزیر مۆریان کردوەو هەلاتوون . دەستی کرد بە جموجۆلی سیاسی و عەسکەری و جەماوەری لەناوەخۆ و لەسەر ئاستی ئیقلیمی و جیهانیش بێ وچان لە تەقەلادا بوو، لە هەردوو ئاستدا سەرکەوتنی مەزنی بەدەستهێنا، بەرەبەرە ئەستەمبۆل و سولّتانی لاوازو پەراوێز کرد، ئەنجومەنی گەورەی تورکیای دروستکرد لە مانگی 1920/4 بەناوی (بێۆیچ تورکیلی مجلسی)، بارەگای هەموو ئەو دام و دەزگایانەی لە 1920وە بەرە بەرە خستە ئەنقەرەو خەڵکی بە سولّتانەوە نەهێشت، لەسەر ئاستی ئیقلیمی و جیهانیش ئەمریکا و یۆنان و ئیتالّیا و فەڕەنسا سارد بون لە سیڤەر و پێیان وابوو زۆر لە قازانجی بەریتانیایە، روسیا و ئەمریکا دژایەتی سیڤەریان کرد، بەریتانیا و فەڕەنساش ساردبونەوە نەوەك تورکیا بکەوێتە باوەشی روسیای بەلشەفی ، تەنها یۆنان لایەنگیری جیبەجێ کردنی سیڤەر بوو،بەلام دەشی ووت زۆر لە قازانجی بەریتانیایە، وەك دیڤید ماکدۆناڵد دەڵێ سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتی یۆنان لایەنگیری دەوڵەتێکی کوردی بوو بە پێی سیڤەر ،بەو شێوەیە بارودۆخی سەرهەلدانی ئەتاتورك هاتە کایەوە ،ئەتاتورك دروست کردنی تورکیای نوێو هەلوەشانەوەی سیڤەری پیکەوە گرێدابوو ،بەتایبەتی ئەودووبەشەی (سێیەم و هەشتەم)لەسیڤەر کە تایبەت بوو بە چارەنوسی کوردو ئەرمەن ،بە مەبەستی هەلوەشاندنەوەی سیڤەر دەستی کرد بە سەودا

و ڕێکەوتن و چارەسەری کێشەی سنور، لە 1921/3/13 لەگەڵ ئیتاڵیا ڕێکەوتن، لە 1921/3/16 قرمی دا بە روسیا،لە 20/ 1921/10 لەگەڵ فەرەنسا ڕێکەوتن ،دوای لە 1920/5/30 کلیلکاشی دا پێی ، لە هەمان کاتدا بە مادەی (22)ی عوصبەالامم ومەرجەکانی ئینتدابی قایل بوولەسەر میراتەکانی، بەو شێوەیە خۆی توندوتۆڵ کرد بە سنورێکی نوێی تورکی دوور لە پەیام و سنورەی عوسمانی هەلی گرتبوو ،لەگەل ململانیٚ لەگەل سیڤەر لەهەمان کات داوای ویلایەتی موسڵیش کردەوە .

ئەوەی زۆر یارمەتیدا گۆڕانکارەکانی هەلویستی بەریتانیا بوو ،لەدوای دەسەڵات گرتنە دەستی محافزین لەمانگی تشرینی 1922 ڕایان بەرامبەر کێشەی کورد و سیڤەر بەسەلبی گۆڕا ، چەرچل لە وەزارەتی موستەعمەرات نەما کە زۆر لایەنگیری لە سیڤەر دەکرد، لە 1922/10/11 بەریتانیا و ئەتاتورك ڕێکەوتنێکی تری مەیدانییان مۆرکرد، لە 1921/3/12 کۆنگرەی لەندەن کراو لەلایەن بەریتانیا (کیرزن) و لەلای تورکیا (بکر سامی) بەتەواو پاشگەزی لە سیڤەر و مافی کورد کرا،هەر لەو کۆنگرەیە دەرکەوت لێرە بەولاوە ئەوەی نوینەرایەتی تورکیا دەکا ئەنقەرەو ئەتاتورکە نەك سولتان وئەستەمبۆل، چونکە بۆ ئەو کۆنگرەیە دوو نوینەری تورك چووبوون،یەکیان تۆفیق پاشای سەرۆك وەزیرانی ئەستەمبۆل بوو ،ئەوی تریان سامی بەگی نوینەری ئەنقەرە بوو ،لەویٚ تۆفیق پاشا کشایەوە (یان کشێندرایەوە)تاکە نوینەر سامی بەگ بوو کە نوینەری ئەتاتورك بوو ،ئیتر لە بەرەی دیپلۆماسیش کۆتایی بە عوسمانی هات، ئەوەی جێبەجیٚ کرا تێپەڕ بوو بوو ئەو هەموو مەرجەی کە خرابووە سەر تورکیا لە قەرەبۆو قەدەغەکردنی چەك و قەبارەی هێزی عەسکەری وئیمتیازاتی کۆمپانیاکان و زۆر کاری گەورەتر چاوی لیٚ خشێنرایەوە بۆ ئەتاتورك.

بەپێی پەرەگرافی (2) ی مادەی (3) ی لۆزانی 1923، (عصبة الأمم) یش لەکۆبۆنەوەی ژ: 30 لەبەرواری 20/ 9/ 1924گەواهی کردو لە 1924/11/31 لیژنەیەکی نیو دەولەتی پێك هینا بۆچارەسەری کێشەی ویلایەتی موسل(بۆ زیاتر بڕوانە کیشەی ویلایەتی موسل لەومەوسوعەیە) کە بوە هۆی دیاری کردنی سنوری خوارووی تورکیا بەناوی (سنوری برۆکسل) وئەو دیزاینەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەتەواوی لە کۆنگرەی لۆزان خەملی .

لەو ڕێکەوتنەی لۆزانیش بەردەوام بوو لە ملکەچ کردن و هەمواری سنور لەگەل یۆنان وبولگاریا، لە ڕووی یاساییشەوە وازی لە دورگەکانی دودیکانیز هێنا بە پێی مادەی (15) ،بۆ قوبرس مادەی(17)، مادەکانی 17 و 20 وولاتانی عەرەبی ، هەندێ بەشیشی سەبارەت بە دەربەندو ئال وگۆڕی تورك ویۆنانی بوو ، مادەی (3)ش سەبارەت بە سنور لەگەل عیراق و پرسی ویلایەتی موسل بوو کە بە (کۆمەلەی گەلان )سپێردرا .

<u>**زەرەرمەندان**</u> : وەك دەرکەوت زەرەرمەند زۆرن بەلام هەرەزەرەرمەندەکان کوردوعوسمانی بوون، بەپێی هەندێ سەرچاوە (بەتایبەتی سەرچاوە ئیسلامیە عربیەکان) پێیان وایە هەموو ئەو کار و کردەوانەی ئەتاتورك بریتی بوو لە ڕێکەوتن و سیناریۆیەکی مەزن بۆ لەناوبردنی خەلافەتی عوسمانی، دەلێن هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانی یەکەم لە پشت ئەستەمبۆل سوڕابونەوە بۆ ئەنادۆل، واتە دەیانتوانی ئەستەمبۆل داگیر بکەن و سولتانیش بەدیل بگرن، بەلام بەپێی شارەزایانی بەریتانی و فەڕەنسی ئەوکارە (واتە روخاندنی خەلافەت بەدەستی غەیرەدین) زیاتر هەست و نەستی موسلمانانی جیهان قولتر دەکاتەوە بۆ زیندو کردنەوەی سیستەمی خەلافەت وەك چەند جاری پێشوو رویدابوو، بۆیە ئەو شارەزایانە پێیان وابوو خەلافەت بەیەکجاری لەنێو دەچێ ئەگەر بەدەستی کۆمەلێك بن کە بە ناو موسلمان بن، ئەوە بووە رۆلی گرنگی ئەتاتورك، هەر بۆیەش رۆژئاوا و لایەنەکانی رێکەوتننامەی سیڤەر زەمینە سازییان بۆکرد، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی رێکەوتننامەی نوێ مۆربکەن لەگەلّ تورکیای سەردەمی ئەتاتورك، ئەویش لەلای خۆی بەرەبەرە هەنگاوی لەدژی عوسمانی دەناو بەوشێوەیەی خوارەوە لە نێوان 1920 هەتا 1932 ئەو کارانەی کرد:

1- لە 1920/7/1 یاسای جینائی هێنایە جێی سنورە شەرعیەکان.

2- لە 1922/11/1 سەلتەنیەتی هەلوەشاندەوە و سولتان محەمەد واحدالدین دەرکرا.

3- لە 1922 پایتەخت لە ئەستەمبۆل گواستەوە بۆ ئەنقەرە.

4- لە 1923/10/29 خەلافەتی وەرچەرخاندە سەر کۆماری و ئەتاتورکیش بووە سەرکۆمار.

5- له 1924/3/3 خەلافەت هەڵوەشێنرایەوە.

6-لە1924/4/28دادگا شەرعیەکانی هەڵوەشاندەوە.

7- له 1924/10/4 یاسای مەدەنی سویسری بەسەر تورکیا پیادەکرد.

8- له 1928/4/10 بەیەکجاری ئەو ماددەیەی دەڵێ (ئاییینی فەرمی دەوڵەت ئیسلامە) لە دەستوری تورکیا (ئەنایاسا) لادرا.

9- له 1928/11/11 پیتە ئیسلامیەکان، یان یاسایانەتر بڵێین پیتە عوسمانیەکانی گۆڕی بۆ پیتی لاتینی .

لەبارەی زەرەرە گەورەکانی کوردستان بەبەراوردێکی سادە لەو پرۆژەو گەلالانەی لەدواساتەکانی عوسمانی وگەلالەکانی ئەتاتورك بەڕوونی دەردەکەوێ بەتایبەتی ئەنجامەکانی کە تائیستاش لەبەرچاوە . پرۆژەی بەدەولەت بوونی کوردستان لەلایەن فرید پاشای سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل ـ سوڵتان واحدالدین) بە فەرمی مۆرکرابوو[1401]، دیڤید ماکدۆناڵدیش هەر وای بۆچوە لە کتێبەکەی خۆی و ئۆتۆنۆمی سەرەتای سەربەخۆیی بوە چ لە ڕێی ئینتداب چ لە ڕێی ئۆتۆنۆمی، بۆ وەرگرتن و بون بە ئەندام لە (عصبة) سێ پۆلی وەردەگرت موستەعمەرە و دۆمینیۆ و ئەوانەی ئۆتۆنۆمیدارن[1402]، ئەوەش دەقا و دەق خوردکراوەتەوە لە سیڤەر هەم لە ڕێکەوتنەکانی پیشووی کوردوعوسمانی لە سالانی دوای 1912، لێرەوە چاکتر بۆمان دەردەکەوێ کە ئیجابیەکانی سیڤەر بۆ کورد لەوە دێت، کە وەفدی عوسمانی بەشدار بووە نەك وەفدی تورکیای ئەتاتورك، وەفدی عوسمانی بریتی بوو لە (هادی پاشا ود.رەزا تۆفیق)، بەلام لە (مذکرات جمال باشا)واهاتوە گوایە فریدپاشاو 4 وەزیر مۆریان کردوەو هەلاتوون ، هادی پاشاش ئەو کەسەیە بە نوێنەرایەتی سوڵتان محەمەد واحدالدین وفرید پاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی ڕێکەوتنی سەربەخۆیی کوردستانیان بەو قۆناغانە

---

[1401] د عثمات علی ـ دراسات فی الحركة الكوردية المعاصرة ص325-326، هەروەها بڕوانە: بە لگەنامەی بریتانی Air512 تەلەگرام لە 1919./4/18

[1402]ـ الأمم المتحدة فی نصف القرن ص25

لەگەڵ شێخ عبدالقادر شەمزینی و شەریف پاشاو ئەمین عالی بدرخان مۆرکرد، لەبەڵگەنامەیەکی بەریتانی (FO.371/5067) هاتوە دەڵێ: فەریدپاشا لایەنگیری دروست بونی دەوڵەتی کوردی کردوە لەرێی ئۆتۆنۆمی ناوەخۆ، ئینجا دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە(سوڵتانی عوسمانی وفرید پاشا) علی ئیحسان پاشایان ڕاسپارد بە بروسکەیەکی فەرمی لە 1919/10/30 مومتەلەکاتی عوسمانیان تەسلیمی حکومەتی شێخ محمود کردو دانیشیان پێدا هێنا، دەسەڵاتی ئەستەمبۆل پیشوو تریش دانی بەمافی میللەتی کوردزۆربەی میلەتانی تر هێنا بە شێوازەکانی سەردەم ،ئەوەش لە گەلالەیەکی گەورەی جامیعەی ئیسلامی ،بەلام سەرکەوتوو نەبو،لە کۆتایی سەدەی 19 سوڵتان عبدالحمید لەگەڵ شێخ سەعیدی نەوڕەسی و جمال الدین ئەفغانی وئەبووهودا رفاعی ،ئەسعەد قەیسەرلی لە مدینە ،شێخ فەزلەلاّ لە ملیبار،شیخ محمد زاهیر لە ئەفریقا ،حسێن بن علی لە مەکە ..،بیری جامیعەی ئیسلامیان گەڵاڵەکرد، بریتی بوو لە کۆمەڵە دەوڵەتێکی: کوردستانی و عەرەبی و تورکی و چەرکەسی و ئەفغانی...لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی (عوسمانلی)*، دانیان بە مافی چارەنووسی میللەتانی عوسمانی هێنا لەنێویشیان دا کورد،[سمبرشمتر] ئەوەش هاندەری ڕێکەوتنێکی تری عوسمانی و کورد لەسەرەتای سەدەی بیستەم بووە لەبارەی سەربەخۆیی کوردستان، لەلایەن عوسمانی وەفدێك کە پێك هاتبوو لە شیخ الإسلام صبری زادە (سەرۆك)، وەزیری کار ئەحمەد دەبوق، وەزیری دەریایی عەونی پاشا، وەفدی کوردیش بەسەرۆکایەتی عبدالقادر شمزینی و مەولانە ڕەفعەت بەگ وئەمین بەگ، کەواتە هەر هەمان رێڕەوە لەسیڤەریش ڕەنگی داوەتەوە.

لەسەر ئەو بنچینە دەسەڵاتی عەلمانی ئەنقەرە بە سەرۆکایەتی ئەتاتورك ڕێکەوتنی سیڤەری بە(مەرگی تورکیا) زانی، دەستی بەکارو چالاکی هەمە لایەن کرد بۆ لەبار بردنی سیڤەرودۆزینەوەی بەدیل ، بووە هۆی زیاتر ناکۆکی لەنێوان ئەنقەرە و ئەستەمبۆل، بەشێوەیەك ئەستەمبۆڵ دانی نا لەناوەخۆو لەدەروە بەسەربەخۆیی کوردستان و ئەنقەرەش لەدژ بوو، بەرە بەرە ئەنقەرە لەهەوڵ و تەقەلاکانی تاکتیکی و ستراتیژی خۆی لەهەمو بەرەکانی جەنگی و سیاسی و دبلوماسی دەست

---

* لەوکاتی کۆمەلێك لەو جامیعانە هاتنە کایەوە ،لەوانە : جامیعەی جەرمەنی ،جامیعەی لاتینی ...ئینجا جامیعەی ئیسلامیش .

[1403] ئەوکاتی ئەزموونی جامیعەی جەرمانی و جامیعەی ئەمریکای لاتینی و... هاتبووە کایەوە.

پێکرد، کوردێکی زۆری عەلمانیش بۆلای خۆی ڕاکێشا، تاوای لێهات بەپشتیوانی ئەو کوردانە وەك (رائول ویلسن) گۆتەنی بەسەر ئەستەمبۆڵ زال بوو، ئینجا سیڤەریش هەڵوەشاندەوەو لۆزانی 1923 ی هینا جێی، کەلەنێوان143مادە128 جار ناوی تورکی تیا هاتبوو ناوێکی کوردو کوردستانی تێدانەبون،لەو ریکەوتنە زۆر لاقازانج وزەرەری بە ریژەی جیاجیا کرد بەلام ئەوەی هیچ قازانجی نەکرد تەنها زەرەر عوسمانی وکورد بوون، تا ئیستاش کورد لە لۆزان بوە گەورەترین زەرەر مەند.

<u>**ڕۆلی خراپی کورد لە کۆنگرەی لۆزان**</u>: ڕۆلی کورد نەك هەر نەبوو بەلکو تەنها ئەو ڕۆلە بواری پێدرا کە ئەو دەستکەوتانەی لە سیڤەرو پیشووتر هاتبوە دی هەلوەشێنرایەوە ،لێرە رۆلی عەلمانی وئاینی کوردبەئاشکراتر دەرکەوت،عەلمانیەتی کورد هەنگاو بە هەنگاولایەنگیری هەنگاوەکانی بەرەو عەلمانیەت وناشیۆنالیزمی عوسمانی بەرەو تورکیایی و ئینجا ئەتاتورك بوون،بە پێی بەڵگەنامە بەریتانیەکان کە لەسەر زاری(بیرترام دیکسۆن) وەرگیراوە لە سەرانسەری کوردستان لە: بەتلیس وجزیرەو وان و دیاربەکرو سەعەرتەوبادینان وسلێمانی وخۆئی وماکۆو سەلماس وموکریان و.. لە هەلچوون بووینە دژ بە زالکردنی تورکایەتی ودابەشی کوردستان، بە سەرکردایەتی ئەو (6) سەرکردە ئاینیە( مەلا سلیم بدلیس، رشید ئاغەی سلێڤانی، عبدالرحمن شرناخی، شێخ نوری بریفکانی، شێخ عبدالسلام بارزانی، شیخ سعید الحفید)[شمبرشمتر] ،دوایش هەریەکەلە ( شیخ عبدالقادر، شیخ سعیدی نەورەسی، شیخ سعیدی پیران، شیخ محمود، ..)دژی ئەتاتورك بوون، بەڵام چینی عەلمانیەتی کورد داوایان لەوانە کرد ئەو هەنگاوەیان رزگاری کوردەو دەوڵەتێکی عەلمانی تورکی مافی کورد مسۆگەر دەکا، لەلای زانایانی ئاینی کورد بەفەرمی هەمو جیهان لەڕێی (عصمە الامم)ئاگادارکرایەوە ،تیایدا هاتبوو کە کوردو تورك تەنها لەڕێی لەئاین یەکیان دەبەستێتەوە ، ئاینیش نەما لەسەردەستی ئەتاتورك ئیتر برایەتی کورد و تورك هەلخەلەتەنێرە ، بۆیەزانایانی ئاینی ڕەوشەنبیر داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کرد، کۆمەڵێك لە ڕەوشەنبیران و نیشتمان پەروەرانیش لاگیری ئەو ڕایەی زانایانی ئاینی بوو،جگە لەو کەمە سیکۆلاریەی کە لاگیری ئەتاتۆرکیان کرد،ئەوان یارمەتیاندا بۆ سەرکەوتنی کۆنگرەی لۆزان ،بەلام لاوازبوون وەك لە بەڵگەنامەی بەریتانی لەلایەن جێگری مەندوبی سامی

[1404]ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص154

بەریتانی لە18/ مایس/1920 ناردوە و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر) بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە، زیاتر لەگەڵ ئەتاتورك ڕۆیشتون[1405]، لازاریف دەڵێت: هەندێك لە بنەماڵەی بەدرخانیەکانیش (لائیکیەکانیان) خەریکی دانوستان بون لەگەڵ ئیتیحادیەکان داوای پارچە زەوی گەورەو 2000لیرەیان کردبوو[1406]، ئەو هەنگاوەی سیکولارە کوردەکان لەناوەوە بە جۆرێکی تر ڕەنگی دابۆوە کوردانی دەرەوەی وولات ،کوردانی دەرەوەی وولات نەیان زانی ئەو ئەفەندیانەی کورد بەهۆی بەلێنی سودو پۆستەوە نزیك ئەتاتورك بووینەوە نەك بۆ مافی کورد ، لە بەڵگەنامەی بەریتانی ژ:21 لە 1929/4/18 بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نوسراوە دەڵێ:کوردەکانی دەرەوەی وولات مانگانە یارمەتی60.000$ یان بۆ ئەتاتورك دەنارد، تا بزوتنەوەی خۆیبون تێیانیگەیاند یارمەتیەکەی پێ وەستاندن، تەنانەت ئیحسان پاشاش کە لەدواییدا لە 1927بە شۆڕشی ئاگریداغ هەڵسا، لایەنگیری ئەتاتورکی کرد و ئەفسەری بەرپرس بوو لە سەربازگەی ئەستەمبۆل و تەسلیمی ئەتاتورکی کرد لە دژی سوڵتان[1407]، بەو شێوەیە کوردە رۆشنبیر و لائیك (عەلمانی) و سەرۆك عەشیرەتەکان بەشداریی و پشت گیریان لە دام و دەزگا و حکومەت و پەرلەمانی ئەتاتورك کرد لەژێر ناوی (برایەتی کورد و تورك لە دەوڵەتی تورکیای نوێ).

ئەوە بوە پیشەکیەکی ئاسان بۆ ئەوەی هەندی لائیکی کورد هەنگاوی مەترسیدار تر بنێن لەکاتی بەستنی کۆنگرەی لۆزان ، ئەتاتورك وەفدێکی لێ رێکخستن بەسەرۆکایەتی عصمت ئینینۆ، دووکوردیشی بەگەردا (برنجی زادەو زولفی بەگزادە)، ئەوان لەوێ چوونە لۆزان بەناوی کورد قسەیان کرد، وتیان: ئێمە و تورك براین، دەمانەوێ پێکەوە بژین، نامانەوێ جیاببینەوە مادەکانی (62ـ64)ی سیڤەر دەبێ هەڵگیرێ، فراکسیونی کورد 72 ئەندامی تێدابو لە ئەنجوومەنی مەزنی تورکیا لە ئەنقەرە کە ئەتاتورك دروستی کردبوو، بەسەرۆکایەتی (حسن خەیری) بوو، بروسکەی بەناوی هەمو کورد بۆکۆنگرەی لۆزان دەکرد، دەیان ووت: سیڤەر و سوڵتان و ئەستەمبۆڵمان ناوێ،

---

1405ـ دەقی ئەوبەلگەنامەیە لە(ئیجابیەکانی سیڤەرـ دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر) بڵاوکرایتەوە.

1406ـ دراسات فی الحركة الكوردية المعاصرة ص252

1407ـ بڕوانە: شۆڕشی ئاگری داغ ـ نوسینی ئیحسان نوری پاشاـ ل22

شریف پاشامان ناوی، جیابونەوەمان ناوێ، بەڵکو لۆزان و ئەتاتورك و ئەنقەرەو برایەتی تورکمان دەوێ[1408]،تا سیڤریان هەلوەشاندەوەو لۆزانیان هێنا جێی .

**پاداشی ئەتاتۆرك بۆ ئەو کوردانە :** دوای ئەوەی ئەتاتورك زال بوو بەسەر ئەستەمبۆڵ و بەیەکجاری خیلافەتی هەڵوەشاندەوە و کۆماریکی تورکی عەلمانی لەسەر بنچینەی تورکایەتی دامەزراند لە 1923، لە دەستور (ANA YASA) نکۆلی لە کورد کرا و دەستی بە داخستن و قەلا چۆکردنی دام و دەزگاو فەرهەنگ و کەلتووری و سیاسی کرد، کە پێشتربەئازادانەتر لەئەستەمبۆڵ ئیشیان دەکرد، محمد زەکی بەك دەڵێت(هەمو ئەو جەمعیەت وحزبە کوردیانەی کورد دروستی کردبون لە ژێر سایەی خیلافەت ئازاد بون، بەڵام ..لەگەل تسلیم بونی ئەستەمبۆل بە حکومەتی کمالی هەموی داخستن)[1409]، بەرنامەیەکی ترسناکیش دارِشرا بۆ قەدەغەکردنی زمان و جل و بەرگی و تەوای فەرهەنگی کوردی... بەوانەش نەوەستا هەڵسا بەگرتنی هەمو ئەوانەی یارمەتیان دا، دادگایەکی ریك خست بەسەرۆکایەتی (صائب پاشا) بۆ لەسێدارەدانی سەرکردە کوردەکان، ئەو دادگایە گەیشتە هاریکارەکانی ئەتاتورکیش، لەوانە (حسن خەیری وبرنجی زادە و زولفی بەگزادە و خالید پاشا..)

بەو شێوەیە تیۆرەکانی لائیکی کوردلەگەل ئەتاتورك بە شکستی گەورەو سەرکەوتنی لۆزان تەواو بوو ،ئەزمونەکەیان گەیشتە ئەوەی کورد لەنزیکی سەربەخۆییەوە دوور خستەوە بەرەو هەڵدێر.... ئنجا شیخ سعیدی جارِی شۆری (1925) داو، دروشمی یان گەرِانەوەی خیلافەت یان ئێمەش کوردستانیکی سەربەخۆمان دەوێ، لەو شۆرِشە هیچ بەلگەیەکمان بەدەستەوە نیە داوای سیڤەری کردبیت ودژی لۆزان بیت ، ولاتانی رِوسیاو بەریتانیاو فرنساش پاڵپشتی تورکیایان کرد، خەریك بو شێخ سعید سەرکەوی دوای شکستی هێناو بەیەکجاری لۆزان سەرکەوتوو بوو و مەینەتی کوردی بەرجەستە بوو.

[1408]ـ بەیتار دەرسیمی لە ل221ی کتێبەکەی خۆی(دەرسیم لە مێژووی کوردستان) دەلێ حسن خەیری بە خۆی هەمو ئەو قسانەی بۆ گێرِامەوە کە چۆن بروسکەیان بۆ کۆنگرەی مەسلەتی لۆزان لێداوە .

[1409]ـ خولاسە.. ل314 . لە ل315 باس لە داخستنی رۆژنامەکوردیەکانیش بە هەمان شێوە دەکا .

(47)

# ریكەوتنامەی جزائر اتفاقية جزائر Algeria Agreement

ئەوانەش دەگریتەوە (تالۆگ، ئۆپیك،ریكەوتنی قوستەنتینیە،ئاشبەتال، ..)

لە پەراویزی كۆبونەوەی لوتكەی ئۆپیك لە 4-1975/3/6 لە پایتەختی جزائر چەند دانیشتنێك لە نێوان شای ئیران وسەدام حسین(ئەوكاتی جیگری ئەحمەدحسن بكربوو) ئەنجام درا، بە نێوبژی سەرۆكی جزائر(هواری بۆمیدیان) بۆ چارەسەر كردنی كێشەكانی نێوانیان كەبە(كێشەی سنوری)ناوزەد دەكرا ،ئەو كیشانە كۆن بوون دەگەڕایەوە بۆسەردەمی سەفەوی وعوسمانی ،بەلام لەدوای هاتنە سەر حوكمی حزبی بەعس لە سالی 1968 جاریكی تر تەقیەوەو ڕەهەندی تری وەرگرت ،زۆر جۆرە نێوبژی دەكرا سەركەوتوو نەبوو ،بەتایبەتی شای ئوردەن بەشداربوو لەو بەیەكگەیشتنەی جزائر ئەگەرچی ئەندامیش نین لە ڕێكخراوی ئۆپیك ، ئەو ڕێكخراوە لە4سپتمبری 1960 لە بەغدا دامەزرا لە نێوان (سعودیەو ئیرانو عیراق وكویت وڤنزویلا) بۆ ریكخستنی نرخی نەوت وناردنی ، یەكەم كۆنگرەی لوتكە لە جزائر بەسترا لە بەرواری سەروو تیایدا عیراق وئیرانیان پیكهێنایەوە ،ڕاگەیەنراویكی لێك تیگەیشتن بلاوكرایەوە ،بوە هۆی مۆركردنی ڕێكەوتنامەیەك وسێ پرۆتۆكۆلیكی سنور كە بە ڕێكەوتنی جزائر بەناوبانگە.

گرنگ ترین ڕووداو تیایدا شۆرشی ئەیلول بەسەرۆكایەتی مەلامستەفای بارزانی كۆتایی پێهێنرالەبەرامبەریشدا عیراق دەستی لە هەندێ ئاوو وخاكی خۆی هەلگرت ،دوایش شۆرشیش هەلگیرساوەو ئاووو خاكەكەشی چوو ،ناچار جاریكی تر لە 1980/9/17 ئەو ڕێكەوتنامەیەی یەكلایەنی هەلوەشێاندەوەو بوە جەنگی عیراقی ئیرانی ،دوای لەسالی 1990 جاریكی تر عیراق بە فەرمی بەو ڕێكەوتنامەیە رازی بۆوە بە هۆی نامەیەكی كراوە لەلایەن سەدام حسینەوە بۆ هاشمی رەفسنجانی سەرۆك كۆماری ئیرانی ئەوسا .

ناوەڕۆكی ڕێكەوتنامەكە

یەکەم : ریکەوتنامەی جزائرپێکهاتبوو لە چوار مادەی سەرەتایی وەك ڕێکەوتنی بنەمایی وتیایدا لەمادەی یەکەم بڕیاڕدرا ڕێکخستنەوەی سنور بە پێی پرۆتۆکۆلی قوستەنتینیەی سالی 1913 ، مادەی دوەم هەمان پرۆسە بۆ ووشکایی وکەنداویش بە پێی هیلی تالۆگ،مادەی سێیەم ناوی شۆڕشی کوردی تیا نەهاتوە بەلام جەوهەری ڕێکەوتنامەکەیە کە تیایدا کۆتایی پێبهینرێت، لەو مادە بەو فۆرمە هاتبوو :گێڕانەوەی متمانەی هەردوولا بە ئارامی سنورو کۆتایی هێنان بە تێکدەران چی تر بتوانن سنور بەکاربهێنن کە لەدوایدا لە پرۆتۆکۆلی سێیەم بەناوی (ئاسایشی سنور) گوزارش کرا، مادەی چوارەم زیاتر بەلای گرینتی جیبەجێ کردنی ڕێکەوتنامەکەیە کەواهاتبوو هەرسێ مادە بێلێکجیاکردنەوە جێبەجێ دەکرێت ،لەکاتی پێویست هواری بۆمدیان لەسەر هێل دەبێت بۆ جیبەجێ کردنەکەی ،لەژێر سایەی ئەو چوارمادەیە پرۆتۆکۆلەکانی تر داڕژران بەلام بەشێك پێیان وایە دیوی نهێنی تیایە ،لەلای ئیران شۆڕشی کورد پەك بخاو یارمەتی سەربازی عیراقی بداو ئەوانەی دژینە تەسلیمی بکات وەك لە 1976 پینج سەرکردەی (ی ن ك)ی ڕادەستی عیراق کردەوە ،لەلای عیراقیش یارمەتی لە عەرەبەکانی ئەهوازو معارەزەی ئێرانی وشۆڕشی زەفار دەماودەست ببڕێت ،بەهۆی ئەو ڕێکەوتنە لەسالی 1979 خمینی لە نەجەف دەرکرد .

دوەم : سێ پرۆتۆکۆلەکە ، دوانی بریتی بوو لە ریککەوتن لەسەر دەست نیشان کردنی سنور بەپیی ریکەوتنەکە،یەکەمیان پیك هاتبوو لە 8 مادە،دوەمیشیان پێکهاتبوو لە9 مادە ،هەرچی پرۆتۆکۆلی سێیەمە سەبارەت بە ئاسایشی سنورو پرسی ڕوخانی شۆڕشی کورد لە خواروو بەتایبەت باسی دەکەین .

لەدوای ریکەوتنی جزائر لە 6ی ئادار زنجیرەیەك کۆبوونەوە لە ئاستە جیاجیاکان لە بەغداو تاران کرا ،لە 17ی ئادار و20ی نیسان و20ی مارس ..تا لە 13ی حوزەیران هەردوو وەزیری دەرەوەی عیراق(سعدون حمادی)و وەزیری دەرەوەی ئیران (عباس خلعتبری) سێ پرۆتۆکۆلەکەیان مۆر کرد ،دەقەکانیان لەکۆتایی ئەو بابەتە بلاو دەکەینەوە .

<u>رۆژانی ڕەشی کورد لەو ڕێکەوتنەدا</u>

ڕێکەوتنی 11ی ئادار کۆتایی بەوە هێنا کە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول کرێگرتەی هیچ لایەك بن ،ئەگینا ئەو هەنگاوەی نەدەنا ،کە بوە مایەی تووڕەەیی شای ئێران ، بەلام هەلس وکەوتی حزبی بەعس و چوونی حزبی شیوعی و یەکیتی سۆڤیت بۆ پال بەعس کوردی ناچار کرد شای ئیران بە پشتیوانی خۆی وەرگرێ ، پیشوو تر لە 1973/12/1 لە چاوپێکەوتنی سەدام بە وەفدی کوردی دیارە ئاماژەی بەوەها سەودایەك داوە[1410]د محمود عوسمانیش ئەوەی دووپات کردۆتەوەو دەلێت: سەدام حسین لەسالی 1973 داوای لەبارزانی کرد(مسعود)بنیری بۆبەغدا بەلام بارزانی رازی نەبوو ئەوبنێری ئەندامیکی تری (م س)ی نارد،لەوێ سەدام پیی دەلێ بەبارزانی بلێ وامان لینەکا ناچارمان بکات تەنازول بۆ شای ئیران لە کەنداوی عرب و شاش یارمەتی لەوان ببڕێت،د محمود دەلێت ئەو ئەندام (م س)ئەو پەیامەی نەگایاندبوو تا دوای شکستی شۆڕش ئینجا بۆ ئێمەی ئاشکرا کرد،ناوی ئەو ئەندامە ناهێنێ بەلام دەلێت تا ئیستاش لە (م س)پارتیە[1411] دوای لە ل316ی کتیبی(مسعودبارزانی —بارزانی وبزوتنەوەی کورد)ناوەکەمان بۆدەرکەوت خوالیخۆش بوو (محمدمحمودعبدالرحمن-سامی) بوە ، وادیارە سەرکردایەتی کوردبەو ئەندازەیە ئاگادارو شارەزای نێودەولەتیان نەبوە ،بۆیە کەوتنە نێو بۆسەکە، بە پێی هەلسەنگاندنیکی(د محمودعوسمان لە: الحزب الديموقراطی الکوردستانی —اللجنة التحضيرية —تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها) ئەوا بارزانی گەورە واتیگەیشتبوو کە شای ئیران ناتوانێ پشتی شۆرش بەربدا بەهۆی ئەمریکاوە ، ئەوەبوو لەدوای یەك سال لە شەڕی 1974 ئەو ڕێکەوتنە دەکرێت ، شۆڕشی ئەیلول (کەلە 1961هەلگیرسابوو) تێکڕووخا ،لە بەرامبەر داڕووخانی شۆڕشی کوردستان، عێراق ئاوو خاکێکی زۆری کردە دیاری بۆ شای ئێران، سەرەنجامی ئەو شۆرشەش وەك ئەوانی تر تاسەقفی دیاریکراو گەشەی کرد، ئیتر تیغی فاکتەری ئیقلیمی ملی شوڕشی بڕیەوە، کە فاکتەرێکە زیاتر دوزی کوردی ئالوز کردیە، میللەتانی ژیر دەستە لە دووفاکتەری ناوەکی —داگیرکاری ودادگەری نەبوونی یاسای دوەلی قەیرانی هەیە، بەلآم کورد لەدوای دابەش بوونی لە1916 سێ قەیرانی کوشندەی ناوەکی وئیقلیمی وجیهانی هەبووە ،

---

[1410] بڕوانە ل317ی بارزانی و بزوتنەوەی کورد .

[1411] الحزب الديموقراطی الکوردستانی —اللجنة التحضيرية —تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها-الدروس والعبر المستخلصة منها ص50

هەربەو بەو شێوەیە شۆڕشی ئەیلول شکستی هێنا و (پ.د.ك) جارێ كۆتایی خۆشی هێناو هیچ حیزبێكی نیشتمانی لە گۆڕەپان نەما، هەندێ لە ناحەزانی شۆڕشی ئەیلول بە (ئاشبەتاڵ)یان لەقەڵەم دا چونكە هێشتا شۆڕش خاوەنی دەیان هەزار پێشمەرگەو پارەوپوول و هێزی لوجستی و مادی زۆر بوو، بەپێی روونكردنەوەكەی (لیژنەی ئامادەی پ دك- دمحمودعوسمان)60000پ مو15 ملیۆن فیشەك و ناوچەیەكی فراوانی ئازادیش لەبەر دەستی شۆرش بووە لەگەل ئیمكانیەتی مادی زۆری تر[1412]، وادیارە لەلایەن شای ئێرانەوە فشاریان خراوەتە سەر بۆ كۆتایی پێهێنان بە پێی ڕێكەوتنی جەزائری 1975/3/6 ،دوای 5 رۆژ واتە لە 11ی ئادار شای ئیران بەدوای بارزانی دەنێری لەڕێی (ئەرتەشبود ئەسیری) پێی ڕادەگەیەنی(لە دیدەنیەكی كورت)بە فەرمی بارزانی گەورەی ئاگادار كردۆتەوە كە بڕیاری نێودەولەتیە دەبێ شەڕبوەستێ و پیشمەرگە لە سنور نەمێنێ ووتویەتی ئەوان لەگەل بەغدا ڕێكەوتون دەیانەوێ دەماودەست ئێوەش شەڕ ڕاگرن وپیشمەرگەو سەركردەكان یان بێنە ئێران وەك پەناهەندە یان بگەڕێنەوە مالی خۆیان[1413]،وادیارە وەلامی بارزانی وابوە ووتویەتی بەسەرچاو ئێوە براگەورەن چی لەبەرژەوەندی ئێوە بێت دەیكەین ،هەلبەتە ئەو جۆرە ئاخاوتنە ئاشكرا دیارە لەو پەڕی بێچارەیی و بێپشتیوانی بوە ، لە مادەی سێیەمی ڕێكەوتنی جزائر ئاماژە بە ئاسایشی سنور دەكا،دوای دووكۆبوونەوەیەكی پرۆتۆكۆلی یەكەمیان لە تاران لە 15ی ئادارودوەمیان لە 1975/5/20لەبەغدا لەوبارەیەوە دەبەسترێت ، لەسەر ئەو بنچینەیە پرۆتۆكۆلی ژ:3 تایبەت دەكرێت بە ئاسایشی سنوركە پێكهاتوە لە دیباجەیەك و8 مادەو لە 1975/6/13 لەلایەن هەردوو وەزیری دەرەوەی عیراق و ئیران مۆر كرابوو .

لەو ڕێكەوتنە پرۆتۆكۆلیە ناوی كوردو شۆڕش و جەنگ نەهاتوە ،لەجیاتی باسی سنوربەزێنی تێكدەرانە كراوە ،لە مادەی یەك بڕگەی یەكەم باس لە هاریكاری هەوالگری سەبارەت بە تیكدەران وسنوربەزێنانە ،لە بڕگەی دوەم هەردوولا لەژێر سایەی زانیاری (بڕگەی یەكەم) ئیجرائەتی پێویست

[1412] بروانة : الحزب الديموقراطي الكوردستاني –اللجنة التحضيرية –تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها-الدروس والعبر المستخلصة منها .

[1413] عیسا پژمان –نهینیەكانی ریكەوتنامەی جزائیر ل106.

بەهاوبەشی دژبەکەسانی تێکدەر. مادەی دوەم شەش بڕگەیە بریتیە لە داختنی ئەو دەربەند وڕێچکانەی کە سنوربەزێن وتیکدەران بەکاری دەهێنن لە سنوری تورکیاوە تا خانقین ،مادەی چوارەم بۆ جیبەجی کردنی ئەو مادانە کەسانی شارەزاو هێزی بەشەری بۆ تەرخان بکرێت .مادەی پێنجەم تایبەتە بە ڕادەست کردنی تیکدەران وسنوربەزێنانی هەرلایە بۆلاکەی تر .مادەی شەشەم دەشێ لەکاتی پێویست هەندێ ناوچە چۆل بکرێت و یان ئاوەدانی لێنەهێلرێ .مادەی حەفتەم سەرۆکانی ئیداری وهەوالگری ئەو ناوچانە لیژنەی هاوبەش پیکدەهینن وکۆبوونەوەی دەوری دەکەن یان کۆبونەوەی ناکاو ئەگەر پێویست بوو . مادەی هەشتەم ونۆیەم هەمان ڕێوشوێن بۆ ناوچەکانی خواروو وکەنداوی عەرەبی جێبەجێ دەکرێت .

ئەنجامی ڕێکەوتنامەی جەزائیر

بەو شێوەیە بەرەبەرە ڕێکەوتنەکە بەبێ گرفت جێبەجێ دەبوو ،ئەو ڕێڕەوانەی خوارەوەی وەرگرت:

7-بە پێی یاسای ژ:69ی سالی 1976 دەولەتی عیراقی ئەوڕێکەوتنەو نەخشەی نوێی سنوری عیراقی ئیرانی بە یاسایی کرد.

8-شۆڕشی ئەیلول وشۆڕشی زەفار ڕووخان و ئاسەواریکی وایان نەما .

9-معارەزەی هەردوولا کپ کرانەوە .

10- بێئەوەی تەقەی شۆڕش مابێت بەدرێژایی سنور بەدیوی کوردستانی عیراق بە قوولایی 20کم ناوچەکان بوونە قەدەغەو بە سەدان گوند دابەزێندران بۆ کۆمەلگەی زۆرە ملێ ،ئینجا دەست کرا بەهاریکاریەکی مەترسیداری ئیرانی وعیراقی وهەندێ جار تورکیش ،خەریك بوو کورد بخنکێ لەناکاو شەپۆلی شۆڕشی ئێران هاتوو شای فرێدا هەندەران .

11- لە چەند بەلگەنامەیەکی بەریتانی هەندێ زانیاری تازە دەردەخا، لە بەلگەنامەی ژ:٥٨ی بەرواری ١٥/مایۆ/١٩٧٥کە لەلایەن بالوێزخانەیان لە بەغداوە نوسراوە باس لەوە دەکا کە کوێیتیەکان لەو ڕێکەوتنامەیە نیگەران بووینە، هەروەها لە بەلگەنامەیەکی تری بالوێزخانەیان

له كويت داكۆكی لەو ڕاستيە دەكا ولە هەردوكيان باس لەوە دەكا: كەوەزيری دەرەوەی بريتانی بە نوسينێكی فەرمی لە ١٩٧٥/٣/١٢-واتە دوای ٦ رۆژ لە ريكەوتنەكە- بۆ (مەجليسی عمومی بريتانی) پالپشتی بەريتانيا لەو ڕێكەوتنامەيە دەكا .

12- ئەو ڕێكەوتنە ئاستيكی دەولی وەرگرتوە ،لە تۆمارگەكانی نەتەوە يەكگرتوەكان ژمارەی 14903 و14907 ی بۆدياری كراوە لە تۆمارگەكانی نێوان ئيران وعيراق ،لەهەندی مادەی پرۆتۆكۆلەكەش پالپشت كراوەتە سەر ميساقی نەتەوە يەكگرتوەكان .

13- هەندێ گلەيی و دەنگ دژی ئەمريكا بەرز بۆوە كە ميلەتيكی بيكەسی وەك كورد كرايە قوربانی ..بەلاك هنری كيسنجری وەزيری دەرەوە هەموی دەم كوت كردنەوە بەوەی كە (وەزارەتی دەرەوەی ئەمريكا جێی خيرو سەدەقەو زگسوتانەوە نيە ..جێی سياسەت وبەرژەوەنديە ) .

دوای ڕوخانی شۆڕشيان كە تاكە ئوميدی كوردانی هەمو پارچەكان بوو ،چيان لەدەست نەمابوو تەنها پاڕانەوەونوزانەوە بۆلای خودای گەورە ،تيايدا داوايان دەكرد ئەو زولمەی لێيان كرا تۆلەيان بۆ بكرێتەوە ،لەو تۆلەوە شای ئيران چی خراپە بەسەری هات ،سەداميش دوا ديمەنی بينرا ،ڕوويان لە جزائريش بوو دەيان ووت لەكاتی شۆڕشی جزائر كورد يارمەتی زۆری داون ،تەنها شيخ امجدزەهاوی يارمەتيەكی زۆری بۆ شۆرشی جزائر لە كوردستان بۆ كۆكردەوە گەيشتە 200000ديناری عيراقی ئەو كات[1414] ،كەچی جزائر دژی ئەو ميلەتە بیٚ چەك وبێپشتيوانە لەسالی 1963لە هەلمەتی يەكەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسيەكان هێزی سوريا بە فەرمی هات يارمەتی عێراقی دا ، پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائيری وفرۆكەوانانی يەمەن وهێزی هندی وپاكستانيش يارمەتی عێراقيان دا[1415]،دوايش ئەو زولمەی ڕێكەوتنی جزائری هاتە سەری لەسەر دەستی هواری بۆميديان ،دوعاو پاڕانەوەكان لەوانيشی كاركردو زۆری نەبرد چ نەخۆشيەكی سەختی گرت ،تەنها 5سالی خاياند ڕێكەوتنامەو سەرخانەكانی هەموی هەلوەشايەوە .

---

[1414] الامام امجد الزهاوي-المعهد العالمي للفكر الاسلامي ص222

[1415] رۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەيلول - ل168

**بەرەو هەلوەشاندنەوە** : ئەو بارودۆخە بەو شێوەیەی ویستیان زۆر درێژەی نەکێشا کۆمەلێك گۆڕانکاری و ڕوداوی نوێ هاتە کایەوە ئەو ڕێکەوتنەی خستە لێژی بۆ هەلوەشاندنەوە ،هەرە گرنگەکانی ئەوانەی خوارەوە بوو :

1-هەلگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ هەر سالێك دوای مۆر کردنی ئەو ڕێکەوتنە وڕووخانی شۆڕ شۆڕشیکی تری کوردستان هەلگیرسایەوە .

2-لەسەرەتای 1978ڕاپەڕینی ئیران دەستی پێکردو لە 1979 شای ئیران ڕووخا کە ڕێکەوتنەکەی مۆر کردبوو ،ئیرانی نوێ (کۆماری ئیسلامی ئیرانی)نەك پابەند نەبوو بەو ڕێکەوتنەبەلکوبوە گەورەترین یارمەتیدەری ئۆپۆزیسۆنی عیراقی کوردو عەرەب وشیعە .

3-لادانی ئەحمەد حسن بکری سەرۆك کۆمارو هاتنی سەدام حسین خۆی لەسالی 1979 .

4- لەگەل سەرکەوتنی شۆڕی ئیرانی عیراق کەوتە دۆخیکی دژایەتی و ناکۆکیەکی توندکەوتە نێوانیان ،لەسەر ئەو بنچینەیە (مجلس قيادة الثورة)ی عیراق لە مانگی 9ی 1980 بڕیاڕی هەلوەشاندنەوەی دا، لە 1980/9/17 سەرۆکی عیراق(سەدام حسین)بە ووتارێك بەرامبەر (مجلس الوطنى العراقى) ڕەزامەندی بەکۆی دەنگ وچەپلە لێدان لێوەرگرتن وبەو دەقەی خوارەوە ڕێکەوتنامە جزائری هەلوەشاندەوە :

عنوان التشريع: الغاء اتفاقية الجزائر بين العراق وايران المعقودة في 6 اذار 1975

التصنيف: قرار مجلس قيادة الثورة رقم التشريع: 1507

سنة التشريع: 1980 تاريخ التشريع: 1980-09-17 00:00:00

إستناداً إلى أحكام الفقرة (أ) من مادة 2 والأربعين من الدستور المؤقت. وبالنظر لإخلال الحكومة الإيرانية بإتفاقية 6/آذار/1975 والبروتوكولات الملحقة بها نصًا وروحًا وذلك من خلال عدم إحترامها لعلاقات حسن الجوار، وتدخلها السافر والمتعمد في شؤون العراق الداخلية وإمتناعها عن إعادة الأراضي العراقية المغتصبة والتي جرى الإتفاق على إعادتها إلى السيادة العراقية الكاملة بموجب الإتفاقية المذكورة. الأمر الذي يدل على أن الجانب الإيراني يعتبر إتفاقية آذار عام 1975 في

حكم المنتهية.

لذلك فقد قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ 1980/9/17، إعتبار تلك الإتفاقية ملغاة وإعادة السيادة الكاملة من الناحية القانونية والفعلية على شط العرب والتصرف وفقًا لذلك.

وعلى هذا الأساس فقد قرر مجلس قيادة الثورة، ما يلي— :

1- إلغاء القانون رقم 69 لسنة 1976 حول تصديق معاهدة الحدود الدولية وحسن الجوار المعقودة بين حكومة الجمهورية العراقية والحكومة الإيرانية والبروتوكولات الثلاثة الملحقة بها مع ملحقاتها الموقع عليها في بغداد بتاريخ 13/حزيران/1975 والإتفاقات الأربع اللاحقة لها مع ملحقاتها الموقع عليها في بغداد بتاريخ 26/كانون الأول/1975 مع الرسائل المتبادلة والمحاضر المشتركة.

2- ينفذ هذا القرار من تاريخ صدوره وينشر في الجريدة الرسمية ويتولى الوزراء المختصون تنفيذه

صدام حسين- رئيس مجلس قيادة الثورة

## دەقی ڕێکەوتننامەی جزائرو پرۆتۆکۆلەکانی

الملحق رقم

**نصوص إتفاقية الجزائر بين الحكومتين الإيرانية والعراقية والتي وقعت عام ١٩٧٥**

*اولاً: نص إتفاقية الجزائر ٦ آذار/ مارس ١٩٧٥*

*ثانياً: معاهدة الحدود العراقية-الإيرانية (١٩٧٥) والبروتوكولات الملحقة بها والخاصة بالحدود البرية والنهرية وأمن الحدود.*

*ثالثاً: نصوص الرسائل المتبادلة بين وزيري الخارجية العراقي والإيراني*

**أولاً: نص إتفاقية الجزائر**

"تطبيقاً لمبادىء سلامة التراب وحرمة الحدود وعدم التدخل في الشؤون الداخلية قرر الطرفان الساميان المتعاقدان:

١- إجراء تخطيط نهائي لحدودهما البرية، بناءً على بروتوكول القسطنطينية لسنة ١٩١٣م ومحاضر لجنة تحديد الحدود لسنة ١٩١٤م.

٢- تحديد حدودهما البرية حسب خط "التالوك" (وهو خط وسط المجرى الرئيسي الصالح للملاحة عند خفض المنسوب إبتداءً من النقطة التي تنزل فيها الحدود البرية في شط العرب حتى البحر)(*).

٣- بناءً على هذا يعيد الطرفان الأمن والثقة المتبادلة على طول حدودهما المشتركة ويلتزمان بإجراء رقابة مشددة وفعالة على حدودهما، وذلك من أجل وضع حد نهائي لكل التسللات ذات الطابع التخريبي من حيث أتت.

٤- إتفق الطرفان على إعتبار هذه الترتيبات المباشرة أعلاه كعناصر لاتتجزأ لحل شامل، وبالتالي فإن أيّ مساس بإحدى مقوماتها يتنافى بطبيعة الحال مع روح إتفاق الجزائر، وسيبقى الطرفان على إتصال دائم مع الرئيس هواري بومدين الذي سيقدم عند الحاجة معونة الجزائر الأخوية من أجل تطبيق هذا القرار. ويعلن الطرفان رسمياً أن المنطقة يجب أن تكون في مأمن من أيّ تدخل خارجي.

* التالوك- كلمة ألمانية مكونة من قسمين Thal بمعنى الوادي، وWeg، فيكون معناها طريق الوادي، وقد أصبح Thalweg مصطلحاً دولياً لخط مجرى المياه الوسطى، أو التيار الذي يتوسط مجرى النهر. عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية، ج٥، بغداد ١٩٨٨، ص٢٤.

## ثانياً: معاهدة الحدود العراقية – الإيرانية للسنة ١٩٧٥

*نصوص معاهدة الحدود الدولية وحسن الجوار بين العراق وإيران والبروتوكولات الثلاثة الملحقة بها، والخاصة بالحدود البرية والنهرية وأمن الحدود.* (*)

*وكان قد وقع على هذه النصوص في بغداد يوم ١٣ حزيران/ يونيو عام ١٩٧٥ عن العراق الدكتور سعدون حمادي وزير الخارجية، وعن إيران السيد عباس خلعتبري وزير الخارجية، كما وقعها السيد عبدالعزيز بوتفليقة وزير خارجية الجزائر. وفيما يلي نصوص معاهدة الحدود الدولية وحسن الجوار بين العراق وإيران:*

- إن رئيس الجمهورية العراقية وصاحب الجلالة الامبراطور شاهنشاه إيران بالنظر الى الإرادة المخلصة للطرفين المعبر عنها في إتفاقية الجزائر في آذار/ مارس ١٩٧٥ في الوصول الى حل نهائي ودائم لجميع الوسائل المعلقة بين البلدين: وبالنظر إلى أن الطرفين قد أجريا إعادة التخطيط النهائي لحدودهما البرية على أساس بروتوكول القسطنطينية لسنة ١٩١٣ ومحاضر جلسات قوميسيون تحديد الحدود لسنة ١٩١٤ في حدودهما النهرية حسب خط التالوك، وبالنظر إلى روابط الجوار التاريخية والدينية والثقافية والحضارية القائمة بين شعبي العراق وإيران. ولرغبتهما في توطيد روابط الصداقة وحسن الجوار، وتعميق علاقاتهما في الميادين الإقتصادية والثقافية، وتنمية العلاقات بين أبناء الشعبين ورفعها إلى مستوى أفضل على أساس مبادئ، سلامة الإقليم وحرمة الحدود وعدم التدخل في الشؤون الداخلية. ولعزمهما على العمل لإقامة عهد جديد من العلاقة الودية بين العراق وإيران على أساس الإحترام الكامل للإستقلال الوطني ومساواة الدول في السيادة ولإيمانها بهذه الصفة في تطبيق المبادئ، وتحقيق الأهداف والأغراض المنصوص عليها في ميثاق الأمم المتحدة، فقد قررا عقد هذه المعاهدة وعيّنا مندوبيهما المفوضين.

رئيس الجمهورية العراقي: سيادة سعدون حمادي وزير خارجية العراق

صاحب الجلالة الإمبراطورية شاهنشاه إيران: سيادة عباس خلعتبري وزير خارجية إيران

اللذين بعد أن تبادلا وثائق تفويضهما التام ووجداها صحيحة ومطابقة للأصول إتفقا على الأحكام التالية:

**المادة الأولى:** يؤكد الطرفان الساميان المتعاقدان ان الحدود الدولية البرية بين العراق وإيران هي تلك التي أجري اعادة تخطيطها على الأسس وطبقاً للأحكام التي تضمنها بروتوكول الحدود البرية وملاحق البروتوكول المذكور آنفاً المرفقة بهذه المعاهدة.

**المادة الثانية:** يؤكد الطرفان الساميان المتعاقدان ان الحدود الدولية في شط العرب هي

(*) هذه النصوص لم يطلع عليها معظم دول العالم.

تلك التي اجري تحديدها على الأسس وطبقاً للأحكام التي تضمنها بروتوكول تحديد الحدود النهرية وملاحق البروتوكول المذكور آنفاً بهذه المعاهدة.

المادة الثالثة: يتعهد الطرفان الساميان المتعاقدان بأن يمارسا على الحدود بوجه دائم رقابة صارمة وفعالة لغرض وقف جميع التسللات ذات الطابع التخريبي من حيث أتت، وذلك على الأسس وطبقاً للأحكام التي تضمنها بروتوكول الأمن على الحدود الملحق بهذه المعاهدة.

المادة الرابعة: يؤكد الطرفان الساميان المتعاقدان أن أحكام البروتوكولات الثلاثة، وملاحقها المذكورة في المواد ١ و٢ و٣ من هذه المعاهدة والملحقة بها والتي تكون جزء لايتجزأ منها هي أحكام نهائية ودائمة وغير قابلة للخرق لأي سبب كان وتكون عناصر لاتقبل التجزئة لتسوية شاملة وبالتالي فإن أيّ مساس بأي من مقومات هذه التسوية الشاملة يتنافى بداهة مع روح إتفاق الجزائر.

المادة الخامسة: في نطاق عدم المساس بالحدود والإحترام الدقيق لسلامة الإقليم الوطني للدولتين.. يؤكد الطرفان الساميان المتعاقدان ان خط حدودهما البري والنهري لايجوز المساس به وانه دائمي ونهائي.

المادة السادسة:

١- في حالة حصول خلاف يتعلق بتفسير أو تطبيق هذه المعاهدة والبروتوكولات الثلاثة وملاحقها فإن هذا الخلاف سيحل في إطار الإحترام الدقيق لخط الحدود العراقية الإيرانية المبيّن في المواد الأولى والثانية المنوه عنها أعلاه مع مراعاة الحفاظ على أمن الحدود العراقية-الإيرانية طبقاً للمادة ٣.

٢- سيحل هذا الخلاف من جانب الأطراف السامية في المرحلة الأولى عن طريق المفاوضات الثنائية المباشرة خلال فترة شهرين إعتباراً من تاريخ تقديم طلب احد الطرفين.

٣- وفي حالة عدم إتفاق الأطراف السامية المتعاقدة تلجأ خلال مدة ثلاثة أشهر الى طلب المساعي الحميدة لدولة ثالثة.

٤- في حالة رفض أحد الطرفين اللجوء الى المساعي الحميدة أو فشل إجراءاتها فإن الخلاف يصار الى حله عن طريق التحكيم.. خلال مدة لاتزيد عن الشهر إعتباراً من تاريخ الرفض أو الفشل.

٥- في حالة عدم إتفاق الطرفين الساميين المتعاقدين حول إجراءات التحكيم فيحق لأحد الطرفين الساميين المتعاقدين اللجوء خلال خمسة عشر يوماً التي تلي عدم الإتفاق الى محكمة تحكيم.. ولغرض تشكيل محكمة التحكيم لحل كل خلاف فإنّ على كل من الطرفين الساميين المتعاقدين تعيين أحد رعاياه محكماً وسيختار هذان المحكمان محكماً

أعلى.. وفي حالة عدم تعيين الطرفين الساميين المتعاقدين محكميهما خلال فترة شهر من تاريخ إستلام احد الطرفين إشعاراً من الطرف الآخر بطلب التحكيم أو في حالة عدم توصل المحكمين الى إتفاق حول اختيار المحكم الأعلى قبل نفاذ نفس المدة المذكورة فان للطرف السامي المتعاقد الذي كان قد طلب التحكيم الحق في دعوة رئيس محكمة العدل الدولية الى تعيين المحكمين أو المحكم الأعلى طبقاً لإجراءات محكمة التحكيم الدائمية.

٦- لقرار محكمة التحكيم الدائمة صفة الإلزام والتنفيذ بالنسبة لكلا الطرفين المتعاقدين الساميين.

٧- يتحمل كل من الطرفين الساميين المتعاقدين نفقات التحكيم مناصفة.

المادة السابعة: تسجل هذه المعاهدة والبروتوكولات الثلاثة الملحقة بها طبقاً للمادة ١٠٢ من ميثاق الأمم المتحدة.

المادة الثامنة: يصادق كل من الطرفين الساميين المتعاقدين على هذه المعاهدة والبرتوكولات الثلاثة الملحقة بها طبقاً لقانونه الداخلي.

تدخل هذه المعاهدة والبرتوكولات الثلاثة الملحقة حيز التنفيذ اعتباراً من تاريخ تبادل وثائق التصديق الذي سيتم في طهران. وبناء عليه فان الطرفين المفوضين من قبل الطرفين الساميين المتعاقدين قد وقعا هذه المعاهدة والبرتوكولات الثلاثة الملحقة.

كتب في بغداد في ١٣ حزيران ١٩٧٥م

عباس علي خلعتبري وزير خارجية إيران- سعدون حمادي وزير خارجية العراق-

لقد تم التوقيع على هذه المعاهدة والبرتوكولات الثلاثة الملحقة بها بحضور سيادة عبدالعزيز بوتفليقة عضو مجلس الثورة وزير خارجية الجزائر.

**برتوكول تحديد الحدود النهرية**

طبقاً لما تقرر في بلاغ الجزائر في ٦ آذار ١٩٧٥، اتفق الطرفان المتعاقدان على الأحكام التالية:

المادة الأولى: يؤكد الطرفان المتعاقدان ويعترفان بأن تحديد الحدود النهرية الدولية بين العراق وإيران في شط العرب قد أجري حسب خط التالوك من قبل اللجنة المختلطة العراقية- الإيرانية- الجزائرية على أساس ما يلي:

١- برتوكول طهران المؤرخ في ١٧ آذار ١٩٧٥.

٢- محضر إجتماع وزراء الخارجية، في بغداد في ٢٠ نيسان ١٩٧٥ والذي وافق، ضمن أمور أخرى، على محضر اللجنة المكلفة بتحديد الحدود النهرية والموقع على ظهر الباخرة العراقية (الثورة) في شط العرب في ١٦ نيسان ١٩٧٥.

٣- الخرائط المائية المشتركة التي، بعد التحقق منها في المكان وتصحيحها ونقل الإحداثيات الجغرافية لنقاط مرور خط الحدود في سنة ١٩٧٥ على تلك الخرائط وقع عليها الفنيون المختصون بعلم المياه من اللجنة الفنية المختلطة ووثقها بالإمضاء المصدق رؤساء وفود العراق وإيران والجزائر في اللجنة. ان الخرائط المذكورة آنفاً والمذكورة أدناه قد ألحقت بهذا البرتوكول وتكون جزء لايتجزأ منه:

خريطة رقم (١): مدخل شط العرب، رقم ٣٨٤٢ المنشورة من قبل الأميرالية البريطانية.

خريطة رقم (٢): السد الداخلي إلى نقطة كبدا رقم ٣٨٤٣ المنشورة من قبل الأميرالية البريطانية.

خريطة رقم (٣): نقطة كبدا إلى عبادان، رقم ٣٨٤٤ المنشورة من قبل الأميرالية البريطانية.

خريطة رقم (٤): عبادان الى جزيرة أم الطويلة رقم ٣٨٤٥ المنشورة من قبل الأميرالية البريطانية.

المادة الثانية:

١- يتبع خط الحدود في شط العرب التالوك، أي خط وسط المجرى الرئيسي الصالح للملاحة عند أخفض منسوب لقابلية الملاحة، ابتداء من النقطة التي تنزل فيها الحدود البرية بين العراق وإيران في شط العرب حتى البحر.

٢- ان خط الحدود المعرف على الوجه المذكور في الفقرة الأولى أعلاه، يتغير مع التغيرات التي يرجع أصلها الى أسباب طبيعية في المجرى الرئيسي الصالح للملاحة، ولايتغير خط الحدود بالتغييرات الأخرى مالم يعقد الطرفان المتعاقدان إتفاقاً خاصاً لهذا الغرض.

٣- يجري التحقق من التغيرات المذكورة في الفقرة (٣) في أعلاه بصورة مشتركة من قبل الأجهزة الفنية المختصة للطرفين المتعاقدين.

٤- في حال إنتقال مجرى شط العرب أو مصبه بسبب ظواهر طبيعية وأدى ذلك الإنتقال الى تغير في العائدية الوطنية لإقليم الدولتين المختصتين أو الأموال غير المنقولة، أو المباني أو غيرها فإن خط الحدود يستمر على كونه في التالوك طبقاً لما نصت عليه الفقرة (١) في أعلاه.

٥- مالم يقرر الطرفان بإتفاق مشترك بأن خط الحدود يجب أن يتبع من الآن فصاعداً المجرى الجديد، يجري إعادة المياه، على نفقة الطرفين، الى المجرى كما كان عليه في سنة ١٩٧٥ طبقاً لما هو مشار اليه في الخرائط الأربع المشتركة والمنصوص عليها في الفقرة (٣) من المادة الاولى في أعلاه. إذا ما طلب ذلك أحد الطرفين خلال السنتين اللتين

وعێراقی وعەشایری کوردی ئابلوقەی هێزەکانی بارزانیان داو ناچارکرا بێتە دیوی کوردستانی ئێران کە ئەو کاتی هێزەکانی سۆڤیەت داگیریان کردبوو .

گەلێ جاری تریش باس لەوەدەکرێ کەشۆڕشی ئەیلول بەجۆرێك پەیوەندی هەبووبێ لەگەڵئیسرائیل...هەڵبەتەئیسرائیل و وولاّتانی عەرەب پەیوەندیان هەیەوولاّتانی عربی وجامعەکەشیان ڕۆلی هەبوەلەدروستبوونی ئیسرائیل،ڕەنگە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول لەڕێی کەنالی جیاجیالەگەڵ خەلکی یەهودی دەسەلاّتداری ڕۆژئاوایان هەتائیسرائیلیش دانیشتبێ،بەلاّم ئەوەی گرنگەهەرپەیوەندیەك هەبووبێت بۆکاتی تەنگانەبووە،ئێ چ کاتەك بۆئیسرائیل لەجەنگی سالی 1967 تەنگاوترنەبوە،لەبەڵگەنامەی ئەمریکی-تیلیگرام:183 لەبەغدابۆوەزارەتی دەرەوە1966/8/19 دەڵێت وەفدێکی ئیسرائیلی سەردانی بارزانی کردوەبۆئەوەی لەکاتی شەڕهەڵگیرسان پێشمەرگەکان بتوانن چالاّکی دژبەعێراق بکەن تانەتوانن بەشداریشەڕی ئیسرائیل بکەن،لەبەڵگەنامەکەدادەلێ ئیسرائیل سەرکەوتونەبوولەوپلانەی وبارزانی بەجۆرێکی تری پێچەوانەکاری کرد،کەچی ئەوەی بینیمان ئەوەبوومەلامستەفالەگەرمەی شەڕی ئیسرائیل وعەرەب1967یەکلایەنی شەڕی ڕاگرتوداوای لەسوپای عێراقی کردبچێت ئەرکی نیشتمانی وئاینیخۆیببینیوبچێتەیارمەتیعەرەب،ئەوەیجێیسەرنجەلەوکاتەیکەعەرەبدەڵێنسەربەئیسرائیلەوەک بوختانلەلایڕۆژئاواشبوختانیشیوعیایەتیونزیکلەسۆڤیەتدەدراپاڵمەلامستەفا .

<u>هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول</u>

لەوەی سەروو دەرکەوت هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بە فیتی دەرەکی نەبوە ، لەبەڵگەنامەیەکی بەریتانی بەژ:10114-229-63لەئیگلتۆنەوەبۆمستەردالاسی وەزیری دەرەوەی ئەمریکی ئەوسا زانیاری ووردی لەبارەی شۆرشی ئەیلول ناردوەو دەلێ سەربەهیچ لایەك نین وهیچ دەستێکی لەپشت نیە،بەڵکوچەوساندنەوەوخراپی دەولەت ئەوشۆرشەی پێ هەلگیرساندون ، لە 1959 زنجیرە ڕووداوەکان دیارن بە سروشتی خۆی وبە پێی یاسای فلسفی(هۆکارو ئاکام)گەیشتە پلەی شۆڕش

هەلگیرسانەوە، چونکە ئیشی موخابەراتی توخمی(ناکاوو نامەعقول ونامۆی)تێدایە،ئینجا کاری دروست کراو جەماوەریەتی زۆر نابێ.

هۆکارە سروشتیەکانی هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول زۆر باس کراوە ،ڕوداوێکی ترهەیە بەڕای ئەو مەوسوعەیە گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ هەلگیرسانەوەی شۆڕش کەم باس کراوە ،لەدوای 14 ی گەلاوێژ لە 1958/10/6 بارزانی گەڕایەوە بەغداوەو تا سالّی 1961 نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك لەگەلّ میری،بە پێی سەرچاوەیەکی دەگمەنی (ئیخوان) ئەوا عبدالکریم قاسم لە پیلان بوە دژ بە بارزانی بۆ تیرۆر کردنی ،بارزانی لە (ساحە التحریر)کۆبونەوەی لەگەلّ لایەنگرانی خۆی هەبوە ،نوینەرانی ئیخوان(ابراهیم منیر و ولید الأعظمی) خەبەری بارزانیان داوە نەچێتە ئەو کۆبونەوەیە چونکە پیلانی تیرۆرکردنی داڕێژراوە لەلایەن قاسمەوە[1453]، بەوهۆیەوە بەغدای بەجێهێشت بێئەوەی پرس بە عبدالکریم قاسم بکات، لەلای عیراق ئەو هەنگاوەی بارزانی بە یاخی لە قەلەم درا،لەدوای ئەوە ڕای جیا سەرهەلدەدا حزبی شیوعی وئەوانەی لەوان نزیکن ئەو جموجۆلەیان بە هاندان ودەستی ئیستعمار وەسف کرد، چەندرۆژێك پیش هەلگیرسانی شۆڕش لە رۆژی 1961/8/22 حزبی شیوعی بەیانیکی دژی ئەو شۆڕشە دەرکردبەناوی(حول الوضع الراهن في كردستان) تیایدا دایە پالّ ئەمریکاو ئیران وئاغەکان-دەقەکەی واهاتوە : (في الفترة بين 20 - 23 تموز 1961، اجتمع السفير الأمريكي في إيران (هولمز) وبمساعدة الملحقين العسكريين الأمريكان وقنصل أمريكا في مدينة رضائية الإيرانية - بعد أن نظموا سفرات في المناطق الكردية من إيران واتصلوا ببعض الشيوخ والأغوات - وفي نفس الوقت قام رئيس الاستخبارات الإيرانية ببعض السفرات المريبة في المناطق الكردية من إيران. وكانت باكورة النشاط التآمري الأمريكي على الجمهورية العراقية إرسال علي حسين أغا المنكوري على رأس عصابة مسلحة بالأسلحة الأمريكية بإشراف مبعوثين أمريكيين والسلطات الإيرانية، وقد اجتاز الحدود العراقية ليفرض سيطرة عصابته المسلحة على ناحية ناودشت ويعتقل بعض موظفيها) ، لەلای (پ د ك)جۆرە هەلویستیکی تربوو ، بەپێی هەندێ سەرچاوە لە کۆتایی مانگی 6ی 1961 کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی (پ د ك)بەستراوتیایدا چەند بڕیاڕیکی گرنگیان دا

[1453]الدكتورة ايمان عبدالكريم دباغ -الأخوان المسلمون في العراق ص593

،لەوانە چەك كڕین وپەیداكردن ،دوەم نامەیەك بۆ سەرۆك كۆماری عیراق وەك دوا مەولەت ،بڕیاڕی سێیەم خۆ ئامادەكردن بۆ شۆڕش ،كۆمیتەی ناوەندی مام جلال ونامەیەكیان پیادا نارد بۆلای بارزانی لە چیای شیرین بو ،ئەو بڕیارنەیان پیگەیاند،بارزانی لەو كات ڕای لەگەل هەلگیرسانی شۆڕش نەبوە ،دوای ڕووداوەكان وهیرشی حكومەت وای كردهەمولایەك ملی شۆڕش بگرن و لە 11ی ئەیلولی 1961 شۆڕشی كورد هەلگیرسا .

قۆناغەكانی گەشەی شۆڕش

لەسەرەتادا لەكاتی دەست پیكردنەوەی شۆڕش (پ د ك) دوودلی پێوە دیار بوو ،بەیانی دەركردوە دژ بەو شۆڕشە،هەمویان كۆك نەبوون لەسەر هەلگیرسانی شۆڕش ، شەڕی گەورە ڕوویدا هەلویستی قاسمی لاواز كردو ڕێی خۆش كرد ئینقلاب بەسەر عبدالكریم كرا ، لە1963/2/8حزبی بەعس وتەیاری ناشیۆنالیزمی عروبی دەستیان بەسەر حوكم داگرت بە سەرۆكایەتی عبدالسلام عارف،كە بە شۆڕشی شوباتیان ناوزەد دەكرد،.

ئەو هەنگاوە بوە مایەی خۆشی سەركردایەتی شۆڕشی ئەیلول و بروسكەیەكی پیرۆزبایشیان بۆ ناردن كە ئەوە لایەك لەو بروسكەیە : (إن ضربات الشعب الكردي تلاحمت بالثورة المجيدة على العدو اللدود للقوميتين الشقيقتين العربية والكردية وبقية الشعب العراقي على الجلاد الأوحد لشعبنا الكردي المسلم وعلى أوكار الخيانة الملطخة بعار دماء شهداء الشعب وقواته المسلحة وكوارثهم وويلاتهم) ، لە 1963/3/11 شەڕوەستانیكی سێ مانگە بە هۆی بەیانیكی (ئەنجومەنی شۆڕش) دەرچوو ،دەلێن ئەو شەڕوەستانەی لەگەل عبدالسلام سەرەتای كیشە ناوخۆییەكان دەست پێدەكات گوایە بارزانی پرسێكی بە (م س)ی پارتی نەكردبوو ، لەدوای ئەو ئینقلابە لەسالێ 1963 حزبی شیوعی لەلایەن بەعسیەكان راوەدوونران و ئەوەی ڕزگاری بوو گەیشتە ناو شۆڕش، لە 1963/9/28بۆ یەكەم جار لە كوردستان ئیزگەی دەنگی كوردستان كرایەوە وەك ئۆرگانی شۆرش بوە تەكانێكی مەزن لە رای گشتی دروست كردن و هۆشیاری وڕێنمایش، ئەو كیشەیەی ناوخۆو هەندێ كیشەی تریحزبی نێو پارتی بە خیرایی كاری لە سەلامەتی شۆڕش دەكرد، لەدوای كۆنگرەی (6)ی قەلادزە لەسالێ 1964

باڵی (م.س) به سەرکردایەتی (ئیبراهیم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی) لەدژی باڵی (مەلا مستەفا بارزانی) گوایە (ڕجعی) و (خێڵەکی) لێك جیابوونەوە ،هەرچەندە لە پێشتر دژایەتی هەبووە بەڵام لەو کۆنگرەویە بە رەسمی ڕووبە ڕووی یەکتر بوونەوە، بە پێی لایەنگرانی بارزانی دەلێن لە 31ی تەمووزی 1963 کەهێرش کرایە سەر ناوچەی بارزان وحکومەت بەدرۆ گۆتی بارزان گیرا ئیبراهیم ئەحمەد هاواری کرد لە خۆشیان، مەکتەبی سیاسی پارتی ئەو سەردەم لەدژی ئەو هێرشە نەوەستان[1454]،سەرەتای (مەلایی) و (جەلالی) لە ناو شۆڕش زۆر بە مەترسی دروست بوو،کە لە راستیدا جۆرێك لە مل ملانێی نێوان عەلمانی وئیسلامی بوو، جەلالیەکان چوونە همدان،بە پێی ڕای (زۆر تایبەتی مام جلال) ئەو کێشەیەی ناو مەکتەب سیاسی بە فیتی حزبی شیوعی بوو لە ڕێی (خەت مائیل)ئەندامیکی بالأی پارتی جیٚ بە جیٚ کرا.

لەو سات وکاتە حکومەت زیاتر هیرشەکانی بۆسەر بنکەکانی شۆڕش دەستی پێکرد بە تایبەتی لەسەردەمی عبدالسلام عارف ،دوای سووتانی (عبدالسلام عارف)لەرۆژی 14/4/1966 دانوستانیك لەگەڵ عبدالرحمن عارف(کە ئەو بوە سەرۆك کۆماردوای دوو رۆژ لە مردنی براکەی) کراو بەیانی (لامرکزی )لە 29/حزیران/1966دەرچوو بۆ چارەی کێشەی کورد، بەڵام سەرەنجامێکی وای نەبوو ، هەندێ قۆناغی تری:

- لە شەری عەرەب لەگەڵ ئیسرائیلی 5ی حوزەیرانی1967سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول یەك لایەنانە شەڕی راگرت.
- لەساڵی1968 بەعسیەکان دەسەڵاتیان گرتەوە دەست وهیرش و پەلامار بۆ سەر شۆڕش زۆر بە توندی دەستی پیٚ کردەوە، جەلالیەکانیش گەڕابوونەوە باوەشی عێراق دژی شۆڕش بەڕەسمی جەنگان.
- لە 11 ی ئازاری1970دوای سەرنەکەوتنی سوپای عێراق لەو پەلامارانەی بوە هۆی دانوستانیکی 4 سالی ودانی نا بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان .
- سەرکردەی شۆڕشی ئەیلول هەمان شەو (لێبوردنێکی گشتی) جاڕدا نەخشەی تێکبەردانی

---

[1454]مسعود بارزانی -بارزانی وبزوتنەوەی کورد ل139 و ل147

حکومەتی هەڵوەشاندەوە.

- یەکەم خیانەتی حزبی بەعسی لەگەل ئەو دانوستانە ئەوەبوو لە 29 /1971/9لەدژی مەلا مستەفا ئەو پیلانە خۆکوژیەی ئەنجام دا، کە چەند پیاوێکی بەدیمەن ئاینی و (هەواڵگری) بەڕووی مەلا مستەفا تەقینەوە، ئەو وەفدە بەناوی (محسن الحکیم) مرجعی شیعەکان هاتبوون کە ڕێزی تایبەتی لای مەلا مستەفا هەبوو، چونکە فتوای حرام کردنی جەنگی لەگەڵ کورد دابوو، دوای پیلان بوو لەدژی هەموو لایەك.
- لەنێوان پیلانەکانی هەمیشەیی عێراق دژی شۆڕشی کورد توانی دووقۆڵیانە (حزبی شیوعی) هەڵخەڵەتێنن، لە 1973/7/17 لەدوای (میثاق العمل الوطني) بەرەیەکی لاوازیان جاڕدا بەناوی(الجبهة الوطنية القومية التقدمية ) بێ پرسی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول کە حزبی شیوعی بەشیك بوو لێی .
- لەساڵی 1974 حکومەت یەك لایەنانە لەگەڵ حزبی شیوعی و هەندێ کورد یاسایەکیان داڕشت بەناوی ئۆتۆنۆمی و دوو دەسەڵاتەکەی (تەنفیزی) و (تەشریعی) کە وێنەی نەبووە لە بێدەسەڵاتی لەو جیهانە.سەرکردایەتی شۆڕش ڕەتی کردەوەو حکومەتیش دەستی بەشەڕ کردەوەو ئەو جارە وڵاتانی سۆشیالیستی دۆستی گەلان و یەکێتی سۆڤیەت و حزبی شیوعی عێراقیش بەئاشکرا یارمەتی عێراقیان دا دژی شۆڕش.
- بەشێك لەسەرکردایەتی پارتی لەوانە :عزیز عەقراوی، هاشم عەقراوی، ئیسماعیل مەلا عەزیز .. لە پێش مانگی ئازار ی 1974گەڕانەوە ناو حکومەت .
- لە مانگی ئادار لەسەر فەرمانی بارزانی بانگی هەمو پیشنەرگە کرایەوە بۆ بنکەو بارەگاکانی خۆیان وخەلکی کوردستان بە تێکڕایی وەلامی پەیامی بارزانیان دایەوەو ڕوویان لە شۆڕش کرد بەلام شکستی هێنا .

**<u>نسکۆ یان ئاشبەتالی شۆڕش</u>:** دوای یەك ساڵ جەنگ و بەرگری سەدان هەزار لە خەڵکی ڕەش و ڕووتی ئەو کوردستانە بە پیلانێکی ناوچەکەو جیهان لە پەراوێزی کۆنگرەی (ئۆپیك) لە جەزائیر

له 1975/3/6 (شا و صدام) به ئامادەبوونی (هواری بومیدیا) و (عبدالعزیز بوتەفلیقەی ئێستاسەرۆك كۆماری جزائرە- ئەوكاتی وەزیری دەرەوە بوو)، بەدەستخۆشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا- بەتایبەتی هینری كیسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەمریكی ڕۆڵی باڵای بینی- دیسان له هەمان( لانه) بەكوردیان وەداوە،له بەرامبەر داڕووخانی شۆڕشی كوردستان، عێراق ئاوو خاكێكی زۆری كردە دیاری بۆ شای ئێران.

لێدوانیكی بارزانی لەو دەم زۆر تراجیدی بوو گوزارشی له بێكەسی كورد دەكردو جاڕی شكست بوو لەهەمان كات گوزارشیش بوو له نارەزاییەكی بێدەسەلاتانە ،ووتی رۆژانی ڕەش چاوەڕێی كورد دەكات ،واش بوو بوە رۆژانی ڕەش وشۆڕش ڕووخا ،وادیارە پیشوو تر له 1973/12/1 له چاوپێكەوتنی سەدام به وەفدی كوردی (محمدمحمودعبدالرحمن-سامی)دیارە ئاماژەی بەوەها سەودایەك داوە[1455]، د محمود عوسمانیش ئەوەی دووپات كردۆتەوەو دەلێت: سەدام حسین لەسالی 1973 داوای لەبارزانی كرد(مسعود)بنیری بۆبەغدا بەلام بارزانی رازی نەبوو ئەوبنێری ئەندامیكی تری (م س)ی نارد،لەوێ سەدام پێی دەلێ بەبارزانی بلێ وامان لینەكا ناچارمان بكات تەنازول بۆ شای ئیران له كەنداوی عرب و شاش یارمەتی لەوان ببڕێت،د محمود دەلێت ئەو ئەندام (م س)ئەو پەیامەی نەگایاندبوو تا دوای شكستی شۆڕش ئینجا بۆ ئێمەی ئاشكرا كرد،ناوی ئەو ئەندامە ناهێنێ[1456]

له ڕێكەوتنی جزائر بڕیاڕی كۆتایی هێنان به شۆڕش درا وادیارە لەلایەن شای ئێرانەوە فشاریان خراوەتە سەر بۆ كۆتایی پێهێنان به پێی ڕێكەوتنی جەزائری 1975/3/6 ،دوای 5 رۆژ واتە له 11ی ئادار شای ئیران (له دیدەنیەكی كورت)بە فەرمی بارزانی گەورەی ئاگادار كردۆتەوە كه بڕێاڕی نێودەولەتیە دەبێ شەڕبوەستێ و پیشمەرگە له سنور نەمێنێ،لە مادەی سێیەمی ڕێكەوتنی جزائر ئاماژە به ئاسایشی سنور دەكا،دوای دووكۆبوونەوەیەكی پرۆتۆكۆلی یەكەمیان له تاران له 15ی ئادارودوەمیان له 1975/5/20لەبەغدا لەوبارەیەوە دەبەسترێت ، لەسەر ئەو بنچینەیە پرۆتۆكۆلی

---

[1455] بڕوانه ل317ی بارزانی و بزوتنەوەی كورد .

[1456] الحزب الديموقراطی الكوردستانی –اللجنة التحضيرية –تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها-الدروس والعبر المستخلصة منها ص50

ژ:3 تایبەت دەکرێت بە ئاسایشی سنورکە پێکهاتوە لە دیباجەیەك و8 مادەو لە 1975/6/13 لەلایەن هەردوو وەزیری دەرەوەی عیراق و ئیران مۆر کرابوو ، لە مادەی یەك بڕگەی یەکەم باس لە هاریکاری هەوالگری سەبارەت بە تیکدەران وسنوربەزێنانە ،لە بڕگەی دوەم هەردوولا لەژێر سایەی زانیاری (بڕگەی یەکەم) ئیجرائەتی پێویست بەهاوبەشی دژبەکەسانی تێکدەر. مادەی دوەم شەش بڕگەیە بریتیە لە داخستنی ئەو دەربەند وڕێچکانەی کە سنوربەزێن وتیکدەران بەکاری دەهێنن لە سنوری تورکیاوە تا خانقین ،مادەی چوارەم بۆ جیبەجی کردنی ئەو مادانە کەسانی شارەزاو هێزی بەشەری بۆ تەرخان بکرێت .مادەی پێنجەم تایبەتە بە ڕادەست کردنی تیکدەران وسنوربەزێنانی هەرلایە بۆلاکەی تر .

دوا تەقەلای (م س)ی پارتی ئەوەبوو لە 1975/3/16 بروسکەیەك دەنێرن بۆ بەغدا بۆ دانوستان وشەڕ وەستاندن بەلام بەغدا ڕەتی کردەوە ..بەو شێوەیە شۆڕشی ئەیلول شکستی هێنا و (پ.د.ك) جاڕی کۆتایی خۆشی هێنا، هەندێ لە ناحەزانی شۆڕشی ئەیلول بە (ئاشبەتاڵ)یان لەقەڵەم دا چونکە هێشتا شۆڕش خاوەنی دەیان هەزار پێشمەرگەو پارەوپوول و هێزی لوجستی و مادی زۆر بوو، بەپێی روونکردنەوەکەی (لیژنەی ئامادەی پ دك- دمحمودعوسمان)60000پ مو15 ملیۆن فیشەك و ناوچەیەکی فراوانی ئازادیش لەبەر دەستی شۆڕش بووە لەگەل ئیمکانیەتی مادی زۆری تر[1457].

[1457] بروانة : الحزب الديموقراطی الكوردستانی –اللجنة التحضيرية –تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها-الدروس والعبر المستخلصة منها.

(50)

## شۆڕشی نویٚ    الثورة الجديدة    New Revolution

(قۆناغی نوێی کوردایەتی، جود ،جۆقد ، ثورة المضادة ..)

بیرۆکەی شۆڕشی نوی راستەوخۆ لەگەل شکستی شۆرشی ئەیلول لە 1975 لەناو شۆرشی ئەیلول هاتە کایەوە ،کاتی چەند سەرکردەیەکی سەربازی وهەندیکی سیاسیش رازی نەبوون بە بڕیاڕی بارزانی بۆ کۆتایی هینان بەشۆرش .

واباوە ئەگەر شۆڕشێك بەهەمان ئاڕستە دووبارە ببتەوە پێی بلێن شۆڕشی نویٚ ،لەکوردستانیش بەدووبارەدروست بوونەوەی شۆڕش لە 1976 لەدوای شکستی شۆڕشی ئەیلولی (1961 - 1975)دەووتریٚ (شۆڕشی نویٚ)، جاریش وایە پێی دەووتریٚ قۆناغی نویٚ لە بزوتنەوەی کورد ،چونکە کۆمەلیك گۆڕانکاری بنچینەیی لێهاتەدی ، ئەگەر چی لە ڕابەرایەتی شۆڕشی ئەیلول (وەك ناوەرۆکی حزبی) کیشە نەبوەو هەمو لایەك کۆکن کە (پ د ك) بوە ،بەلام لە شۆڕشی نویٚ ئەو کۆ دەنگیە نیە ،هەرچەندە (ی ن ك )ڕۆلی بنچینەیی لە هەلگیرسانەوەی شۆڕش بینیوە بەلام هەریەکە لە (پ د ك - س ك) و دوایش حزبی سۆشیالیست و هەندیٚ لای تریش بانگیشەی ئەوەدەکەن کە ئەوانیش بەشداری بنچینەییان هەبوە لەو ڕابەرایەتیە ، بۆیە لەلای (پ د ك) بەو زاراوەیە ناوزەد ناکریٚ بەلکو پێی دەلێن شۆڕشی گولان ، لەدوا بەشی ئەوچەمکە تەقەلای ساغکردنەوەی ئەو پرسە دەدەین بە پێی پرۆگرامی مەوسوعی .

### دۆخی هەلگیرسانی شۆڕشی نویٚ :

یەکیٚ لەتایبەتمەندیەکانی بزاڤی کوردی ئەوەیەکەبزاڤەکانی تر دووگرێی ئالۆزی هەیە،کەچی بۆکورد سێیە، فاکتەرەکانی ناوەکی وئیقلیمی وجیهانیە،زۆربەزەحمەت هەرسێکیان دەسازێن بۆیە هەردەم لە قۆناغی ئالۆزی ودژواریدایە ،لەکاتی هەلگیرسانەوەی شۆڕشی نویٚ جەنگی ساردلەوپەڕی توندی بوو، لە نێوان هەردوو بەرەی شیوعی وسەرمایەداری، لای سۆڤیەت(بەرەی یەکەم) زۆر دژی کورد بوون ، لای سێیەمیش (وولاتانی داگیرکەری کوردستان لەو پۆلە دەولیە بوون) جیهانی سێیەمیان پێدەووت مافی چارەنوس ودیموکراسی لەو ناوچە دوور بوو ،لای بەرەی سۆڤیەتی پێشوو ئەوقۆناغەی ڕۆژئاوایان

ناونابوو (ئیمپریالیزم) و گوایە ئەوە باڵاترین شێواز و دوا قۆناغی سەرمایەداریە، بە ڕزگاری میللەتان ئیمپریالیزمیش دەڕوخێ و کۆتایی سەرمایەداریە..، کەم تر بزوتنەوە رزگاریەکان دەوێران لە رۆژئاوا(بەرەی دوەم) نزیك ببنەوە ، ،جیهانی سەرمایەداری ورۆژئاواش بەپێی بنەمای بەرژەوەندی ئەولایەنەبووهەرلێی بەکورد وەدەدەدرا (من جحرواحد..) ، ولاتانی سۆشیالیست ویەکێتی سۆڤیەت پەیماننامەی (20) ساڵەیان هەبوولەگەڵ عێراق ویارمەتی سەربازی وسیاسیاندەدا،ولاتانی جیهانی سێیەم وجامیعەی عەرەبی شۆڤێنیانەپاڵپشتی عێراق بوون،هەندی وولاتی لاتەریك هەبوون لەگەڵ ڕەوتی دەولی (چین- ماوتسی تۆنگ) و (کۆریا- کیم ئیل سۆنگ) و(سوریایئەسەد) و ( ولیبیا- معمرقەزافی) ئەوانە،رێکخراوی (بەرەی میللی بەسەرۆکایەتی جۆرج حەبەش) لەوخانەبووکەدۆستایەتی تایبەتی لەگەڵ خودی سکرتێری یەکێتی هەبوو،ئەوەش کەمە یارمەتیدەرێك بوو.

-هەرسێ وولاتی (عێراقی بەعس ،ئێرانی شاە ،تورکیای تورانی) رێکەوتنی خنکێنەریان لەدژی کورد دارڕشتبوو، وەك لە پرۆتۆکۆلی سێیەمی ریکەوتنی جزائری سالی 1975 دارژرابوو .

-هەردووحزبی بەعسی دەسەلاتدارلەسوریاوعێراق ناکۆك بوون،زەمینەیەك بۆ(یەکێتی) هاتەبار، بەپێی ئەونامەیەی دفوئادمەعسوم (ئەوکاتی نوێنەری پارتی بوولەقاهیرە) بۆکاك مسعودی ناردووەلە1974/10/16 (ئەواپەیوەندی مام جلال وسوریابۆئەوکاتی دەگەڕێتەوە) لەنامەکەی داباس لەوە دەکا کەسورییەکان ئیهتمام بەمام جلال دەدەن وبیجۆیەکی 404 ودەمانچەکیان پێداوە،بەلام شوێنی بوونی (ی.ن.ك) کە لەناوچەی سۆران بوولەگەڵ سوریا (تەکولۆ) هاتبوو،سودێکی وای نەبووبۆی،ئیترباری ئیقلیمی زورسەخت بوو.

لەسەر ئاستی ناوەکیشدا کاتێ شای ئیران و ئەمریکا لە 1975 یارمەتی شۆڕشیان ڕاگرت دیارە علی عسکری پیشنیاری ئەوەی کردوە کە با شەڕی پارتیزانی بکریت ، مەلامستەفا متمانەی بە بەرپرسەکان نەبوە بتوانن بەردەوامی بە شۆڕش بدەن ، بۆیەشورشی ئەیلول زۆربەبێئومێدی لە 1975شکستی هێناوجارێ کۆتایی هێنانی حزبایەتی وسیاسەت وکوردایەتیش بوولەوەدەمیدا، کەخاوەنی زیاترلە 60000 پ.م وتوانای جەنگی بەهێزوناوچەیەکی فراوانی کوردستانی رزگارکراوی

هەبوو،بێئەوەی هیچ ڕێنماییەك بەو خەڵكەبدرێت،بەوشێوەشاخ وگۆڕەپان چۆل بوو، گۆڕەپانی ڕاستەقینەی كوردستان بۆشاییەكی مەزنی لێ دروست بوو، بەو شێوە كۆتایش بە سیستەمی تاك حزبی و تاك ڕابەری هات، كە بۆ قۆناغی رزگاری ئەو سیستەمە چاكتر بوو نەك فرەلایەنی و فرە رابەری و فرە میلیشیایی كە لە شۆڕشی نوێ وەك دیاردە سەرهەلدەدا ، حكومەتی بەعس زۆرزاڵ بوون بەسەركوردستان،چەندحزبێكی كوردی هەبوولەبەرەی حكومەت بوو وەك:(1- پ دك باڵی جیابووەوەوبەسەرۆكایەتی عزیزعقراوی 2- پارتی شۆڕشگێڕی كوردستان- بەسەرۆكایەتی عبدالستارتاهیرشەریف ئەو باڵەی كە لەگەڵ جەلالیەت نە گەڕایەوە نێوشۆڕشی كوردلەلێبوردنی3/11/ 1970ی مەلامستەفابارزانی.3- بزوتنەوەی پێشكەوتنخوازانی كورد- هەرلەهەمان باڵجیاببۆوە- بەسەرۆكایەتی عبدالله اسماعیل- بەمەلاماتۆربەناوبانگ بوو.4- حزبی شیوعی عێراقی) هەمووی لەبەرەدابوون لەگەڵ حزبی بەعس. .

لەوكاتی تەنهاتروسكایەكی جموجۆڵی (ئەوكاتی پێیاندەووتن كۆنە جەلالیەكان) هەبوولەگەڵ شەخسی (جەلال تاڵەبانی) خۆشی.

-كۆمەڵەڕایەك سەری هەڵدائەوكاتی گوایە ئەوشكستەی شۆڕشی ئەیلول لە ئەنجامی كوردایەتیەكی كلاسیكی وخێڵەكی تاكڕەوی ئاینی بوو،نوقسان بوولەتیۆری زانستی وعەلمانی ومارکسی،بەتایبەتی لەوسەردەمی شكستەكەی كورد هاودەم بوولەگەڵ سەركەوتنەكانی بزووتنەوەماركسیەكان لە (ڤیتنام،كەمبۆدیا،لاوس،ئەنگۆلا،مۆزمبیق...بەوشێوەیەتەیاری عەلمانی ومارکسی زۆرتەشەنەی كردلەكوردستان،حزبی شیوعیش ئەوشەپۆلەی پێهەرس نەكرالەبەرعێراقیەتەكەی،بەپێچەوانەوە بەیانی دەركردئەوجموجۆلەی دروستبوونەوەی شۆرشی نوێی بەتەقەلاكانی ئیمپریالیزم ورەجعی لەدژی حكومەتی نیشتمانی بەعسی لەقەڵەمدا،تەنانەت ڕووخانی شۆرشی كوردبەسەرۆكایەتی بارزانی لە 1975 كەشینی كوردان بوو ئەوان لەكۆنگرەی 3ی 1976ی (حشع) بەدەسكەوتێكی گەورەی وەسفكردو ئەوشۆرشەی بە (رجعی)لەقەلەمدابوو وەك لە دەقی بەیانەكەی واهاتوة:(..وفی مقدمة المنجزات الجبهة الوطنیةالحكم الذاتی وقضیةالتمردالرجعی الكوردی) ،دروشمی كۆنگرەی 3ی (ح ش ع) بریتی بوولە :(دەست لەناودەست بۆپێشەوەبەرەودامەزراندنی سۆشیالیزم لە عێراق) ،دوایش

کەشۆرشی نویٚ هەلگیرسایەوە بەبەیانێك لەسالی 1978ئەوشۆرشەی بەکرێگرتەی ئیمپریالیزم وەسفکرد،دەقەکەی واهاتوە:(..ئیمپریالیزم و وولاٚتانی رەجعی ناوچەکەیارمەتی عەناسری دژبەعێراقی پێشکەوتو وونیشتمانپەروەردەدەن..)،یان جاریش وایە بە (ثورة المضادة)ی ناوزەد دەکرد، پیشووتریش سۆڤیەت عیراقی پرچەك کرد دژی کوردلەسالی 1974-1975، تەنانەت جاروابوو فرۆکەوانی سۆڤیەتی(لە جۆری تۆپۆلیف22)سەنگەری پیشمەرگەی دەکوتاله قازانجی حزبی بەعس ، هەموو ئەو هەلویستە سەلبیانەی (حشع) بووەپێشەکیەکی بەهێزبۆگەشەی کۆمەلّەی مارکسی لینینی کوردستان ودروستبوونی (ی.ن.ك)یش.

***　　　***　　　***

هەمووئەوبارودۆخەناوەکی وئیقلیمی ودەولیەبەوسەختیەزەمینەیەکی سازدابۆدروستبوونی بزووتنەوەیەکی کوردایەتی بەناوەرۆك مارکسی هاوچەرخ جیالەمارکسیەتی شیوعیەرەسمیەکان،بەلاٚم بەگشتی ئەوپرۆژەی شۆرش هەلّگیرساندن بەوبارودۆخەنەگونجاوەی جیهانی وئەقلیمی وناوەکی هەورازێکی سەخت ونیمچە (مەحالّ) بوو،بوێریەکی زۆری دەویست ئەوتەوقەبشکێنن،ئەوەش لەبوێری جەلال تالّەبانی و هاورێکانیان (نەوشیرەوان مستەفا )هاتەدیو(یەکیتی نیشتمانی کوردستانی)یان لە 1حوزەیرانی 1975 جارّدا دوای 3مانگ لە رووخانی شۆرشی ئەیلول ، بەبەیانیکی فەرمی جارِی دروست بوونی (ی ن ك) و دوای یەك سال شۆرشی نویٚ لەسەر دەستی ئەوان دەستی پێکردەوە .

## ئایدۆلۆژیای شۆرشی نویٚ

باسی ئایدیۆلۆجیای شۆرش زیاتر مانای ئایدیۆلۆجیای ئەو حزبەیە کە رابەرایەتی دەکا ،لەبەر ئەوەی ئایدیۆلۆجیای (ی ن ك) بەلای مارکسی بوو وای کرد زۆربەی حزبە کوردستانیەکانی ئەوسا بەرەو مارکسی کشان ،تەنانەت (پ د ك) و (پاسۆك) کە حزبی نەتەوەیی بوون هەردوو کیان هاتنە سەر مارکسیەت ، (پ د ك) لە کۆنگرەی 9ی سالی 1979 لەمادەی (5و6)ی منهاجی تۆماری کردکەلەسەر رێرەوی مارکسی دەرۆن، پاسۆکیش کە خۆی بە حزبێکی نەتەوەیی پەتی هەژماردەکرد کەچی سۆشیالیستی مارکسی کردە ئایدیۆلۆژی .

ئەوەی پالی بە حزبە کوردستانیەکان نا ئاوا بەرەو مارکسی برۆن خودی هێزی ئایدیلۆجیای مارکسی نەبوو ،بەلکو مۆدیل بوونی بوو لە نێو بزوتنەوەی رزگاریخواز و تا ڕادەیەکیش جیاکردنەوەی ناسنامەی شۆڕشی نوێ بوو لەگەل ڕێڕەوی شۆڕشەکانی پیشوو ، وەك لەیەکەم مانفێستی (ی ن ك-1975) هاتبوو ئەوادوژمنەکانی بریتی بوون لەئەمریکاوئیمپریالیزم وزایۆنی رەجعیەتی عەرەبی وبەکرێگیراوانی ئیمپریالیزم وبورجوازیەت ورەجعیەتی کوردی وچینەکانی دەرەبەگ وبورجوازی ونوێنەرانیان لە (سەرخان) حزبی سیاسیدا،کەلەوکاتی خۆی (سەرکردایەتی پ دك. دەنواندبەپێی پۆلینی چینایەتی ئەوسا) ،دۆستەکانیشی بریتی بوون لەسەربازگەی سۆشیالیستی وگەلانی چەوساوەوچینی کرێکارانی (پرۆلیتاری) جیهان لەبەرەی پێشکەوتنخوازی عەرەب، چینی پرۆلیتاریاوزەحمەتکێشانی کوردستان.

(ی ن ك) بە (کۆمەڵە)شەوە لە سەرەتادا بە مارکسیەتی جۆری(ماویەت) کاریگەر بوو، بۆیەش پێکهاتن و دارشتنی شۆڕشی نوێ زیاتر مۆرکی ماویەتی پێوە دیاربوو، کە لە مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی (لەسەر ڕاڕەوی ماوتسی تۆنگ) بۆ سازدرابوو:

1- پێشرەوێکی مارکسی (کۆمەڵە).

2- بەرەیەکی فراوانی چینەکان (یەکێتی)

3- سوپایەکی توندوتۆڵ (هێزی پێشمەرگە).

هەروەها پەیرەوی تیۆری سیاسی شۆڕشگێڕی (توندوتیژ) دەکرا بۆ هێنانەدی ئەو ئامانج و دروشمانە، نەیاربوو لەگەل چەمکی وەك :دیمکراسی، پەرلەمانی، فرەیی، مافی مرۆڤ، هەڵبژاردن، چاکسازیە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان، عەقیدەی میسالی(ئاینی)، ئەخلاقی کلاسیکی، کۆمەڵگەی مەدەنی، کەرتی تایبەت، بورجوازی وبازاڕی ئازاد و لیبرالی و تەغریب بوون.

لە مارکسیەتیش لە خەتە هەرە توندەکەی شۆڕشگێڕی بوون لە (ماوی) دا، بەڵام دوای ئەوەی لە هەندێ بەرەدا لایەنگرانی ماوی شکستیان هێنا، لەوانە لە ناکۆکی نێوان ڤێتنام (بەسەرۆکایەتی

هۆشی مینه- سەر بە سۆڤیەت بوو) لەگەڵ کەمبۆدیا (بەسەرۆکایەتی پۆل پۆت- لایەنگری ماوی چینی بوو)، ڤێتنام زال بوو بەسەر کەمبۆدیاو پۆل پۆت دەسەلأتی دۆڕاند و (هنگ سامرین) لەساڵی 1977 دەسەلأتی گرتە دەست، کە لایەنگری سۆڤیەتی بوو، مارکسیەکانی نێو (ی ن ك)یش زۆر بە ئەزموونەکانی (پۆل پۆت) کاریگەر بوون، بۆیە بەرەبەرە روویان گۆڕی بەرەو سۆڤیەتی. هەتا ناوی (کۆمەڵە)ش لە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) گۆڕا بۆ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان).

لە دوای شکستی شیوعیەت ئایدیۆلۆجیای شۆڕشی نوێ کەوتە قەیران و دەمێك بەرەو سۆشیال دیموکراس و دەمێك بەرەو لیبرالی و دوایش زیاتر نەتەوەیی تاوای لێهات ئایدیۆلۆجیا هەر نەما ،ئیستا هەر حزبەو هیلی ئایدیۆلۆجی خۆی لەچوارچیوەی شۆڕش دیاری ناکا،هەریەکەوسەر بەمەدرەسەیەکی جیهانیە .

<u>**جیاکاریەکانی شۆرشی نوێ**</u>: جیاکاری لەسەر ئاستی ئیقلیمی وجیهانی گەلێ زۆرە ناتوانین بەو دەرفەتە تەسکە باسی بکەین ،تەنها ئەوانەی خودین وپەیوەندی بەناسنامەی هەیە باسی دەکەین ،چەند جیاکاریەکی تایبەتی بە شۆڕشی نوێ هەیە وای کردوە ناوی بنرێ قۆناغی نوێی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان ،کە هەرە گرنگەکانی ئەوانەن:

1- لەزۆربەی شۆڕشەکانی تر یەك حزبی ویەك سەرکردەو یەك هیزی پیشمەرگە بوە ئەو جارە ئەو جۆرە ناوەندیەی تیانەمابوو ،(حزبی تعالی کورد) ڕابەرایەتی شۆڕش 1925 کوردستانی سەرووی کرد شۆرشەکە بەسەرکردایەتی شیخ سعید بوو ، بۆ شۆرشی 1927 ئاگری (حزبی خۆیبونی- سەربەخۆبوون) بۆ ڕابەرایەتی حکومەتی ئەرارات بە سەرکردایەتی (احسان نوری پاشا)[1458] هەبوو ،بۆ کۆماری مهاباد (ح د ك)، بۆشۆرشی ئەیلول (پ د ك) ،کەچی بۆ شۆڕشی نوێ کۆمەلیك حزب هەبوون کەدوای ناویان نرا حزبە کوردستانیەکان(یەکیتی —پارتی —شیوعی-سۆشیالیست-ئیسلامی) وبوونە سەرچاوەی کۆمەلێك جیاکاری تر.

---

[1458]بە پێی بەلگەنامەی بەریتانی (ڕاپۆرتی ئیلفینستۆن) یەکەم سەرۆکی خۆیبوون جەلادەت بەدرخان بووە .

2- هەر حزبەو پیشمەرگەو ئیدارەی شۆرشی خۆی هەبوو ،بوە فرە حزب وفرەسەرکردەی شۆرش وفرە میلیشیاو جۆریك لە بیسەروبەری .

3- بۆ یەکەم جار شەری براکوژی لە چوارچیوەی حزبەکانی شۆرش ڕوویدا .

4- لە شۆرشەکانی پیشوو واهەلکەوتبوو سەرکردەی شۆرشەکە ئاینی بوو بەلام حزبەکە زیاتر ناسنامەی نیشتمانی بوو ، لە شۆرشی نویٚ بۆ یەکەم جار سەرکدەی شۆرش وحزب پیکەوە نائاینی بوون ،خەلکی سیاسی و عەلمانی بوون

5- هەر حزبەو سەرۆکەکی هەبوو بەسەرۆکی شۆرشیش هەژمار دەکرا .

6- هەر حزبەو تیڕوانینیکی هەبوو لەبارەی ڕووداوەکانی ناوچەو جیهان وکاریگەری لەسەر کوردستان ،وەختیك (ی ن ك) لاگیری عیراق بوو لە جەنگی لەگەل ئیران کەچی (پ د ك) لاگیری ئیران بوو ،بەپیچەوانەش لە جەنگی کوردستانی ئیران ودەولەت (ی ن ك)لاگیری کورد بوو (پ د ك)لاگیری دەولەت بوو ..تا ئەو ساتەش ئەو ناتەباییەی تیڕوانین بەردەوامە ،(پ د ك)بەلای تورکیاو (ی ن ك)یش بەلای ئیران .

7- لەگەل زۆر لای تریش .

**<u>هەندیٚ قۆناغی شۆڕشی نویٚ</u>**

لەدوای سالێك لە شکستی  شۆڕشی ئەیلول دەست بە جم و جۆلی پێشمەرگایەتی کرا .

زۆر بەخێرایی گەشەی کرد و هەر بە خێراییش ڕووبەڕووی کێشەی کۆنی (جەلالی ومەلایی) بوونەوە و دووچاری شەڕی براکوژی بوو، یەکەم شەڕی براکوژی زەق لەهاوینی1976 دەستەکەی ئیبراهیم عەزۆ شەهیدکران ویەکێتی وای لە قەلٚەم دا کە ئەوە ئاشبەتالیەکی تر بوو بەشورش کرا لەلایەن پارتی .

ئەو ناکوکیانە پالٚی بە سەرکردایەتی شۆڕشی نویٚ  نا دەست بە سەوداو سەوداکاری لەگەلٚ ئێران و عێراق بکا ویەکەم کەنالٚی دانوستان لەگەلٚ عێراق لەسالی1977کراوەو علی عسکری سەردانی بەغدای کردوو متمانە بەیەکتر زور لاواز تربوو .

لە هەمووی ترسناك تر شەڕەکەی هەکاری بوو لە مانگی 1978/6کە بە سیٚ ڕەتلٚ نزیکەی

(1000) پێشمەرگەیان كۆكردەوە و چوونە سەر (ق.م پارتی)، گوایە بۆ رێكردنەوەو هاتنی چەك و سیلاح لە سوریا، زۆربەی سەركردەكانی مەیدانی وەك: (عەلی عەسكەری، د.خالید، حسێن بابەشێخ، سید كاكە، محمد حاجی محمود، تالیب رۆستەم..) وێران بوون.
لەسالی 1978 شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی دەستی پێكرد و لەسالی 1979 سەركەوت و ئیدی باری یەكێتی و كورد لەو ئاسۆیە تەنگە ڕزگاری بوو بەیەكجاری و هەتا ئەو چركەیەی وا كورد بووەتە سەرۆك كۆماری عێراق هەر كاریگەری ئەو شۆڕشەی پێوە ماوە.
لەهەمان سالٚ عێراق لە حزبی شیوعی داو دیسان بە كوردستان خۆیان گرتەوە، هەرچەندە ئەو شۆڕشە نوێیەو (یەكێتی) لای حزبی شیوعی بە جم و جۆلٚی (ڕەجعیەت) لەقەلٚەم درابوو.
له21- 3- 1979 لەسەر كۆمەلێك هۆكاری فكری و ئیداری و دەروونی و (بزووتنەوە) لە (یەكێتی) بە تەواوی جیابۆوە، نیوەی (پ.م)كانی لەگەلٚ خۆی برد كە نزیكە 800پێشمەرگە دەبوو، دوای لەگەلٚ لیژنەی ئامادەی (پ- د- ك بە سەروكایەتی د محمود)یەكیان گرت و سەركردایەتی یەكی نوێیان لە (دۆلٚەتوو) دانا بەناوی (حزبی سۆشیالیستی یەكگرتووی كوردستان- حسیك )، بەو شێوەیە ناوی شۆڕش كەوتەوە ژێر پرسیارو لە جیاتی فرە میلیشیا سەری هەلدا بە پیچەوانەی شۆرشی ئەیلول كە فرە میلیشیای نەبوو .
لەسالی 1980 لەدوای هەلگیرسانی جەنگی عێراق و ئێران لە كوردستان تەقەلا درا بۆ زال بوون بەسەر فرە هیزی پیشمەرگەو ئیدارە دوو بەرە دژ بەیەك دروست بوو:1- بەرەی نیشتمانی نەتەوەی دیموكراسی(جوقد) كەلە 2/11/ 1980 لە دیمەشق دروست بوو، پێك هاتبوو لە(یەكێتی- شیوعی- بەعسی سەر بە سوریا)،یەكێتی لێی بنچینە بوو2- بەرەی نیشتمانی دیموكراسی (جود) لە1981/1/28 جاڕدرا پێك هاتبوو لە:( حسك- شیوعی - پارتی) ، (حزبی شیوعی) لەناو هەردوو بەرەدا بوو بەو بیانۆیەی كە ڕیش سپیایەتی لە نێوانیان دەكا— حزبی سۆشیالیست بەلای (جود)ساغ بوویەوە هەرچەندە (د محمود) لە جۆقد مۆری كردبوو بەلام رسول مامند دانی بە مۆری ئەو نەناو مۆری لەسەر بەیانی جودكرد،لەسالی 1981 یەكەم شەڕی سەرتاسەری براكوژی دەستی پێكرد ، لەیادی 24- 4- 1974ی قەلادزە بووە خۆپێشاندانێكی سەرانسەری كوردستان بە ڕابەرایەتی یەكێتی و زیاتر جەماوەری تر بوو

حزبەكانی تریش بەرەو كزی بوون دووبارە یەكیتی توانی رابەرایەتی شۆرشی نویٚ وەرگریتەوە .
یەكەم دانوستانی فەرمی سەركردایەتی شۆڕشی نوێو حكومەتی عیراق لەسالی 1983 دەستی پێكرد ، دوای سالیك لە 1985/1/15 شكستی هیناو شەڕ دەستی پێكردەوە، دوای گەیشتە ڕادەی بەكارهینانی چەكی كیمیایی و ئەنفال و ویرانی ، لەدوای وەستانی جەنگی عێراق- ئێران بە تەواوی كەوتنە دیوی ئێران.

لە2ی ئاب 1990 عێراق كوێتی داگیر كرد، هاوپەیمانان لێیانداو عیراق دەركراو شكستی گەورەی هێناو زەمینەی راپەڕین سەری هەلّدا، لە خواروو كلّپەی راپەڕین گەیشتبوە نزیك بەغدا، لێرەش (ی ن ك) وەك هێزێكی بنچینە و پێشڕەو جاڕی راپەڕینی داو سەركەوتوو بوو ،ئیدی قۆناغی شۆڕشی نویٚ كۆتایی دێت و ئیدارەی یاسایی بەرجەستە دەبێت كە لە دوای 1991 دەست پێدەكات .

(51)

# شۆڕشی گوڵان    ثورة كولان    Gullan Revulaition

لەبەر ئەوەی شۆڕشی گولان وشۆڕشی نویٚ هاوتاو جمكن بۆیە ئەو پیٚناس و بارو دۆخەی بۆ شۆڕشی نویٚ پیشان درا هەمانیشەبۆ ئەو شۆڕشە ،لە میٚژوودا زۆر جار ئینشقاقی حزبی بوە دەتوانین بلیٚین لیٚرەبۆ یەكەم جارە ئینشقاق لە شۆڕش دروست دەبیٚ ، لە یەك كات ولەیەك بەشی كوردستان دوو شۆڕش بە دوو ناسنامەی جیا سەر هەلدەدا ، بەو دەروازە دەچینە نیٚو سەرهەلدانی شۆڕشی گولان .

<u>ناوی شۆڕشی گولان</u>: بە پیٚی لیكۆلینەوەی تایبەتی ئەو مەوسوعەیە ناوی شۆڕشی گولان لەوە نەهاتوە كە لەمانگی گولان هەلگیرسابیٚت،بەلكو لەوە هاتوە كە ئیدریس بارزانی بەو 26كەسەی ووتوە ئیٚوە 26گولن كە بە یەكەم مەفرەزەی هەلگیرسانی شۆڕش هەلساون،بۆیە كەمیٚك گومان لەوە دەكریٚت كە یادی سالانە لە 26ی مانگ 5 رۆژ پیش تەقویمی هەلگیرسانی شۆڕشی(ی ن ك)ە ،ئەوانە لە 26ی مانگ شۆڕشیان دەست پیٚنەكردۆتەوە بەلكو لەشەوی 24/25ی سەعات 9 بوە ،لە 26ی مانگ یەكەم چالاكی ویەكەم شەهیدیان داوە ، ئەوانە ژمارەیان 26 كەس بوە نەك(26ی مانگ شۆرشیان هەلگیرساندبیٚتەوە) دوانیان(قادر احمدنبی وحاجی محمد) هەر ئەو شەو دەچنە شارۆچكەی خانە بە تلفۆن ئاگاداری ئیدریس بارزانی دەكەنەوە كە شۆرش دەستی پیكردۆتەوە —ژمارەی تلفۆنی ئەوسای بەبیٚ كۆدەكە3030 بوە وەك خۆیان وادەگیٚڕنەوە ،ئەویش دەلیٚ ئیٚوە چەند كەسن لەوەلاما دەلیٚن 26 كەس ،ئیدریس بارزانی دەلیٚ :كەواتە 26 گول لەشاخەكانی كوردستان ڕوا ...ئەوانە ناویان بەدواكەوت 26گول ،یادی گولان ماناى یادی ئەو 26 بوە ،دوای بەهەلەیی بوە شۆرشی 26ی گولان ئەگینا شۆرش لە شەوی24لەسەر 25 مانگی (5)ی 1976دەستی پیكردۆتەوە، بەلكو لە26ی مانگ یەكەم شەهید دەدەن بەناوی (سیدعبدالله نبی) .ئەوە ناوی ئەو 26 كەسەیە :

1. أحمد نبی محمود
2. علی نبی محمود( علی كۆ)
3. سەید عبداللّه نبی محمود - یەكەم شەهید

4. نبی نبی محمود
5. حاجی سلێمان نبی
6. قادر أحمد نبی
7. کریم أحمد نبی
8. بارزان علی نبی
9. علی محمد مراد
10. مەلا محمد مراد
11. عبدالله محمد مراد
12. نبی محمد مراد
13. عبدالرحمان علی محمد
14. علی عبدالله برایم
15. عبدالله رەسول مصطفی
16. مصطفی رەسول مصطفی
17. شێخە عبدالله سلێمان
18. عبدالله شێخە عبدالله
19. محمد شێخە عبدالله
20. حمە برایم محمود
21. برایم برایم محمود
22. حمدامین حمد خدر
23. رەسول حمد خدر
24. عزیز مەمیسی

دوان لەوانە (علی حاجی شیخە-مەلای حمدامین) بەخێرایی دەگەڕێنەوە ،بۆیە بەناوی (24)کەسەکە ناوزەد دەکرێن ،جاریش وایە بە 23کەس چونکە حاجی شیخە لەگەل ئەوانە دەرنەچوو بەلکو بەچەند سەعاتێك پیش ئەوانە لەڕێی قەسرێ دەرچوو ڕۆلی گرنگ تری هەبوە.

وەك خۆیان دەلێن: لەگەل دەرچوونمان نامەیەکمان بۆ مەلامستەفا نارد هەوالی دەست پیکردنەوەی شۆڕشمان پێڕاگەیاند، ئەویش ئەوە وەلامی بوو(..خۆشحالم بە دروست بوونەوەی پیشمەرگەو ئەو جهودە گەورەتان،بریا بم توانیبایە ببمە پیشمەرگە،هەرچی پیویستیتان بوو ئامادەین، ئاگادار بن باری خۆتان قورس مەکەن خۆتان پەرت وبلاو مەکەن تا خوای گەورە دەرگا دەکاتەوە ڕێگایەك دەدۆزینەوە، زۆریش ئاگاتان لە خۆ بێت ..- نامەکەیان ماوە بەلام خەتەکان سپی بووینەوە)

بەشیك ئەو سەربردەیەی شۆڕشی گولان بە سادەیی وەسف دەکەن وجۆرە سەربردەیەکی تری ڕێکخراوتریان هەیە بەلام ناشتوانن خۆلەو بەرواره رزگاربکەن وەك لەخوارەوە زیاتر دەردەکەوێ .

<u>سەربردەکەی</u> :لە ریکەوتنی 1975ی جەزائیری نێوان (شا و صدام)دەست پێدەکات ، شای ئیران هەمو جۆرە یارمەتیەکی شۆرشی ئەیلولی بڕی ، کۆتایی بە شۆڕشێکی 14 سالەی هێنرا بێ هیچ رێنمایی و نەخشە و پلانێکی نوێ، کۆتایش بە (پارتی) وەك حزب هێنرا، دووچاری پەرتەوازەیی بوون، هێزەچەکدارەکانیان تەسلیم بوونەوەو هەندێکیش بەرەو ئێران، سەرکردایەتیان بێ بڕیار دابەش بوون، بەشێك تەسلیم بوونەوە لەوانە (صالح یوسفی، رشید سندی، حبیب محمد کریم، فارس باوە...)، بەشێك بۆ ئەوروپا و ئەمریکا، بەپێی کتیبەکەی(مسعود بارزانی –بارزانی ووالحرکة الکوردیة )(بارزانی و خانەوادەی) لە تاران جێگیر بوون لەسەر داوای شای ئێران، بەشێکی کەمی بەنیازی ئیشکردن بوون لەوانە: (سامی عبدالرحمن، د.محمود عوسمان، علی سنجاری)، (د.محمود) ئینشقاقی کرد (لیژنەی ئامادە)ی دروست کرد، (علی سنجاری)یش (یەکێتی دیموکراتی کوردستان)ی دروست کرد، (سامی عبدالرحمن)یش (سەرکردایەتی کاتی (س.ك)ی پارتی دیموکراتی کوردستانی دروست کرد.

بەپێیّ تەقویمی خۆیان شۆرشی گولان لە 1976/5/26 دەستیان بۆ شۆڕش کردۆتەوە ،کە تەنها لەگەل یادی شۆڕشی نویّ 5 رۆژیان نێوانە ، بەو شۆڕشە دەووتریّ شۆڕشی گولان کە لەلایەن سەرکردایەتی کاتی (پ د ك) ڕابەری دەکرا .

بە پێی ئەو بەیانەی کە لە 1975/12/10 دەرچوە بە ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان – سەرکردایەتی کاتی) ئارستەی شۆڕشی نویّ بە تازەیی و مۆدیرن ودوور لە سەرکردایەتی پیشوو گوزارش کراوە ،مسعودبارزانیش باسیکی ئەوانە لە نوسینیکی دەکا لە ژ:3695ی رۆژنامەی (برایەتی)بەرواری26ی ئایاری 2002و دەلیّ:(سەرکردەکانی خودی شۆڕش وپارتی کەوتنە پرۆپاگندە لەدژی بارزانی )،ناوی مەلامستەفا وئیدریس بارزانی ومسعودبارزانی تێدا نەهاتبووەی 9ی 1979 دژایەتیەکی بە ئاشکرای بنەمالەی بارزانی کراوە،بۆ ئەو مەبەستە ڕاشکاوانە ترسەیدکاکە لە بیرەوەریەکانی خۆی باسی کردووەو دەلێ :سەرکردایەتی کاتی دژایەتی شۆڕشی ئەیلوولیان دەکرد، خەریکی کتێبی سووری ماوی بوون، لە کێشەکەی هەکاری سەیدکاکە دەلێ بە سامی عبدالرحمنم ووت(ئەو کاتی ئەو سکرتێری قیادەی موەقەتە بوو) ئێمە ڕێکەوتنمان لەگەلّ ئیدریس بارزانی هەبووە، لەوەلاّمدا ووتی:چۆن ئێوە لەخۆتانەوە ئیدریس بەبەرپرسی ئێمە دادەنێن، ئێمە سەر بە ئیدریس نین، هەربەو شێوەیەش لەو کاتی سید کاکە نامەی بۆ مسعود بارزانی نوسیوەو ئەو ڕاستیانەی بۆ ڕوون کردۆتەوە[1459] .

دوای کە کاك مسعود وکاك ئیدریس زالّ بوونەوە بەسەر سەرکردایەتی کاتی ئەوا سامی عبدرحمن وزۆربەی سەرکردەکان جیا بوونەوە:(نوری شاوەیس ،عارف تەیفور ،کریم سنجاری ،دمجیدرشیدجعفر ،دلشادمیران،جوهرنامق..)،بەو شێوەیە زۆر بە هەنگاووبەیانی ڕوون سەربردەی شۆڕشی گولان لە چوارچێوەی مێژووی (پ د ك) بە سروشتی جێی ببێتەوە .

## ئایدۆلۆژیای شۆڕشی گولان

---

1459بڕوانە کتێبی : بیرەوەری پێشمەرگەیەك –سەید کاکە، ب2 ل113- 165 ل152 -156

ئەو جارە بەرەو ئایدۆلۆژیای چەپڕەوی و کرانەوەو وڵاتانی سۆشیالیستی وەرچەرخان، سید کاکە هەر لە (بیرەوەری پێشمەرگەیەك )دەلیت لە کاتی گیرانمان لە دوای شەڕی هەکاری بینیم سەرکردایەتی شۆڕشی گولان هەرخەریکی کتێبی سووری ماوی بوون،تەنانەت لە دوای گۆڕینی سەرکردایەتی سامی عبدرحمن و گۆڕینی بەسەرکردایەتی مسعود بارزانی هەر لەسەر دوور کەوتنەوە لە ئایدیۆلۆجیای شۆڕشی ئەیلول بەردەوام بوون ،لە کۆنگرەی (9)ی ڕاژان 1979 بەتەواوی جاڕی مارکسیانەیان دا لە مادەی (5) و (6)ی پرۆگرام دروشمی دژ بە ئیمپریالیزمی ئەمریکیش بەرز کرایەوە دوو مادەی مارکسیانەش تۆمارکرد:(یسیر الحزب في نظامه السياسي والأجتماعي والاقتصادي على ضوء النظرية الماركسية اللينينية ويقوم بتثقيف وتسليح كوادره ومنتسبيه مركزيا بها)، هەروەها بۆ جۆری (حوکمەکەش) هاتووە: (نناضل من أجل حكم ديمقراطي.. وتحقيق التحولات وفق الأسس الاشتراكية العلمية في جميع المجالات)[1460]، بەڵام هەر تیۆر بوو زیاتر ئەو ئایدیۆلۆجیە لە ئەندام ولایەنگرانیان بەرجەستە نەدەبوو ،چونکە ڕای مەلا مستەفا بەو ئاڕستەیە نەبوو ،باوەڕی بە سۆڤیەت نەبوو زیاتر ئومیدی بە رۆژئاوا بوو ، لەکاتێکا لە راپۆرتیکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی هۆکاری شکستەکەی 1975ی بە (دوورکەوتنەوە لە سۆڤیەت ونزیك بوونەوە لە ئەمریکا)لێکدابۆوە .

## جیاوازیەکانی نێوان شۆڕشی گولان وشۆڕشی ئەیلول

بۆ ئەوەی جیاکاریەکانی شۆڕشی گولان بزانین پیویستمان بەو لیستە بەراوردە لەگەل شۆڕشی ئەیلول، یان دەتوانین بلێین لەگەل کەلتور و فەرهەنگی مەلا مستەفا وشاخ و سەردەمی ئێستای بەرپرسانی (پ.د.ك) لەدوای ساڵی 2007وە،چونکە پیش 2007 ودوای ئەو بەرواره ئایدیۆلۆجیاو هەلس وکەوت وجۆری ئینتماو تەعالیم ومەرجی ئەندامیەتی ..گۆڕدرا،ئەوەش جیاوازیەکانیانە:

| شۆڕشی ئەیلول 1961- 1975 | باری ئێستای (پ.د.ك)- لەدوای2007 |
| --- | --- |

[1460]المنهاج= المادة (5) والمادة (6). کۆنگرە (9)

| | |
|---|---|
| 1- سەرۆكی هەموو كوردستان بوو، نزیكەی 90٪ی میللەتی لەگەڵ بوو. | 1- سەرۆكی ئێستا تەنها سەرۆكی حزبەكەیە، دەنگی حزبەكەش ئیستالە38٪. |
| 2- سەركردەیەكی ئاینی بوو، قەدەغە و (بكە و مەكە)ی بەو تەرازووە بوو. | 2- سەركردەیەكە قایلە بەبنەمای عەلمانی وەك تەرازوو بۆ بڕیار و قەدەغە و هەڵوێستەكانی دادەڕێژێ. |
| 3- لەگەرمەی ماركسیەت و ژیانیشی لە سۆڤیەت هەر چەسپاو بوو لەسەر قەناعەت و بڕواكانی خۆی. | 3- لە كۆنگرەی (9)ی (پ.د.ك) بەتەواوی جاڕی ماركسیانەی خۆیان دا لە بەندەكانی (5) و (6). |
| 4- لەبەر دەرگای دوژمن نەبوو، سەودای لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی نەدەكرد. | 4- ئەو هێڵە بەزێندراو جاریش وایە تاڕادەی پێچەوانە. |
| 5- میللەت یەك ڕێز و یەك مەبەست بوو، جیاوازی حزبی و ناحزبی نەبوو. | 5- میللەت پەرتەوازەو پارچەپارچەیەو فرەمەبەست و جیاوازیەكی زۆری حزبی و هاوولاتی هەیە. |
| 6- سەركردەو پێشمەرگە و حزب لە خزمەتی میللەت بوون. | 6- میللەت كراوە خزمەتكاری حزبی و بەرپرس. |
| 7- دیاردەی ڕاستگۆیی و متمانە و دەست و داوێن پاكی و دڵسۆزی و ئەمەك و سپاردەیی و خۆنەویستی و پەروەردەیی و ئازایەتی و بەرگری نیشتمانی. لەنێوسەركردەو پێشمەرگەو حزب و میللەت باڵی كێشابوو | 7- دیاردەی دەست پیسی، بێمتمانەیی، خۆویستی، گوێ پێنەدان، نەساغی، قۆپیە، بێئینتمایی، شلۆقی نیشتمان پەروەری، بێ وورەیی و بەرگری،.. تەنیتەوە. |
| 8- ئەندامی حزبی و پێشمەرگە هەتا دوای ڕاپەڕینیش بریتی بوو لە كەسێتیەكی بەڕێزی كاریگەر و بەرژەوەندی گشتی خستبووە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی. | 8- ئەندامی ئێستا بریتیە لە كەسێتیەكی لەرزۆك هەردەم بەرژەوەندی تایبەتی خستۆتە سەرووی گشتی، سەرپێچ و یاساشكێنە. |
| 9- پابەند بوون بە فەرمانی سەرۆك. | 9- پابەندە بە فەرمانی مادە. |
| | 10- بەرپرسی مانای دەوڵەمەندی و خاوەن كۆشك و تەلار و باخچە و كۆمپانیا و.. مانای لەسەرووی میللەت و یاسا و خاوەن ڤیتۆ... |

| | |
|---|---|
| 10- بەرپرسی مانای بوونی لە بەرەی پێشەوەو و دڵسۆزی و خۆشەویستی و بێ ماڵ و سامان و سادە.. | خۆبەزلزانی. |
| 11- پاڵنەر بۆ بوون بە پێشمەرگەو حزبی خزمەت و کوردایەتی و خۆشەویستی سەرۆك بوو.. خۆبەخش بوو لەوەوە ناوی (پێشمەرگە) هات. | 11- پاڵنەری بنچینەیی مادەو سەرپێچی و خۆدەرخستن و یان لەپێناو هێنانەدی مەرامێکی تایبەتی،دووره لەمانای پێش مەرگە . |
| 12- ئەندام و پێشمەرگەی بە بیروباوەڕ و وشیار بوون. | 12- ناووشیاری وبێبیروباوەڕ، چەکی بێبیروباوەڕ سێدارەی جەماوەرە (لە دروشمەکانی کۆن). |
| 13-لە سەردەمی مەلا مستەفا لە نێو ئەندامانی پارتی باس باسی کوردایەتی وبەرگری و خۆنەویستی ودادگەری بوو .. | 13-لەسەردەمی مسعود بارزانی باسی پارەو مۆنیکاو ڤێلاوشتی تربوو. |

## هەندێ لە قۆناغەکانی

لەدوای ڕووخانی شۆڕش هەندی جم وجۆل و بەلینی شۆڕش دروست کردنەوە درا ،گوایە شای ئیران بەلینی دووبارەبوونەوەی پیداون ، بەلام وادیاربوو لەناو ئیران هیچ بواریك نەبوو ،بۆیە بە پەرتەوازەیی هەندیك هاتنەوە عیراق هەندیکیشیان بەرەو دروست بوونەوەی سەرکردایەتی کاتی بون دوور لە سەرکردایەتی بارزانی ، ئیتر تا سالی 1979 وادەڕوا ،ئەوانەی خوارەوە هەندێ قۆناغی سەرەکیەتی :

1-بەپێی تەقویمی خۆیان هەر لەگەڵ دروست بوونی (س.ك) لەمانگی (5)ی گولان مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەو (شۆڕشی گولان)ی لیێ دروست بوو یەکەم مەفرەزەیان لە ناوچەی حاجی ئۆمەران بوو کەچی سەرکردایەتی شۆڕش لە ناوچەی هەکاری بوو .

2-کێشەی سەرکردایەتیان هەبوو (بارزانی وازی لە سیاسەت هێنابوو)، بۆیە وارێکەوت کە (ئیدریس بارزانی) وەك ڕابەرێکی ڕەمزی بێت، بەڵام لەدواییدا لە کۆنگرەی (9) بەیەکجاری (سامی عبدالرحمن) لادراو (مسعود بارزانی) بووە سەرۆکی شۆڕش، ناوی حزبی گۆڕا لەناوی (س.ك) بۆوە (پارتی دیموکراتی کوردستان).

3-لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران 1979، ئەوانیش بووژانەوە، لە وەڵامی پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕش (أ. خمینی) داوای لە (بارزانی) کرد بگەڕێتەوە ئێران، بەڵام پێڕانەگەیشت، لە 1979/3/1 کۆچی دوایی کرد، ئەگینا چارەنوسی شۆڕشی گولان  جۆرە ڕەوت و واقعێکی تری دەبوو جیا لە ئێستا.

4-لە 1980/9/17 عیراق بە یەکلایەنانە ڕێکەوتنامەی جەزائری هەلوەشاندەوە ،لە 1980/9/22 جەنگی عێراق ئێران هەڵگیرسا ، زەمینەیەکی نوێی بۆ شۆڕشی گولان هێنا کایەوە ،بەلام لە هەردوو دیوی کوردستان تووشی توشی شەڕی بزوتنەوەی کوردایەتی عیراق وئێران بۆوە.

5-لەو فەترە نەیتوانی دەورێکی چالاك ببینێ، تەنها لە ناوچەکانی بادینان نەبێ ، چەند جارێك دەهاتنەوە کوردستان ولەگەل شۆڕشی نوێ (ی ن ك) تووشی شەڕ دەبوون ،تا لە 1988/5/7 لە بارەگای حزبی شیوعی (بەرەی کوردستانی) جاڕدرا.

6-لە 1988 لەدوای وەستانی جەنگی عێراق ئێران و ئەنفال و کیمیاوی کەوتنەوە دیوی ئێران. تا لەڕاپەڕینی 1991/3/5 هاتنەوە کوردستان بە شلۆقی لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانی.

7-هەرچەندە بەدوودڵی دەیان ڕوانیە ئەو ڕاپەڕینە، بەڵام تەکان و خۆ دروست کردنیان لە هاتنی سەرۆکی حزبیان بۆ مەیدان ڕاستەوخۆ دەستی پێکرد، کادیری عەسکەری و سیاسی و جەماوەری یەکی وایان نەبوو.

لێرەوە کۆتایی رۆلی شۆڕشی گولان دێت ونۆرەی دروست کردنی دام ودەزگاو حکومەت وپەرلەمان دێت .

**کامیان شۆڕشیان هەڵگیرساند** لەگەڵ ڕیکەوتنی جزائیرو دارمانی شۆڕش وادیارە علی عسكری ودكتۆرخالید(خالیدمحمدسعید)پیشنیاری ئەوەی كردوە كە با شەڕی پارتیزانی بكریت ، مەلامستەفا متمانەی بە بەرپرسەكان نەبوە بتوانن بەردەوامی بە شۆڕش بدەن ، بۆیە جاڕی كۆتایی هێنا.

لە بارەی ساغ كردنەوەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نویٚ چەند تەوەرێكی پیویستە ،كیشەكە لەوەیەچەندین حزب پاگندەی ئەوە دەكەن ،لەلایەكی تریش چەندین لا پاگندەی یەكەم تەقەی شۆڕش ویەكەم مەفرەزەی شۆڕشی نویٚ دەكریٚ ،لە نیوان حزبەكان وەك دیفاكتۆ ئیستا زیاتر (ی ن ك) و(پ د ك)ئەو ڕكابەریە لەسەر هەڵگیرسێنەری شۆرشی نوی دەكەن ،بەلام هیشتا چەندین ناوچەی جیا دەلێن لەلای ئێمە یەكەم تەقەو یەكەم مەفرەزەی شۆڕش بوە ،لەوانە لەناوچەی شارەزوور ،هەورەمان ، پشدەر ، حاجی ئۆمەران ، هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لەگەل یەكەم تەقەی شۆڕش لێكجیایە...ئەگەر (ی ن ك) بەلگەی زیاتری هەبێت بۆ ئەوەی ئەوان یەكەم هەلگیرسێنەری شۆڕش بن ئەوا وەك یەكەم مەفرەزە ئەوانەی حاجی ئۆمەرانن ، كە دەیان دوێنین .

دواندنی یەكەم مەفرەزەی شۆڕش: یەكەم مەفرەزەی شۆڕش ئەو 24كەسەن كە لە حاجی ئۆمەران لە حكومەتی بەعس ڕاپەڕین وناوی شۆڕشی گولانیش لەوە هاتوە،كە(پ د ك) سالانە یادی دەكاتەوە ، بە فەرمیش سەرۆكی(پ د ك)پەیامێكی تایبەتی لە 25ی ئایاری2005 بۆ ناردوون ولەرۆژنامەی (برایەتی) بلاو كرایتەوە، هەروەها جاریكی تریش لە نوسینیكیدا لە ژ:3695ی رۆژی 26ی ئایاری 2002 سەرۆكی (پ د ك) ئەو مەفرەزەیە وەك یەكەم دەستپێكەری شۆڕش دەناسیٚ ، بەهەمان ئاڕستەسكرتیری (ی ن ك)یش بە جۆرێكی تر لایەنگری ئەوەیە كە ئەوانە یەكەم مەفرەزەی شۆڕشن وئەو ناوی (حاجی شیخەی بنزیری) دەبات كە یەكێك بوە لەو 26 كەسە، كەواتە كۆدەنگی هەیە لەسەر یەكەم مەفرەزە كێنە ، ڕاستە مەفرەزەیەكی تری بچوك هەبوە بە ناوی (كیخوا محمد مەلا شرەفی)بەلام سەرەتای یاخیەكەی كێشە كۆمەلایەتی بوە دوای ڕەهەندی نیشتمانی وەرگرت، بۆیە دەبیٚ بگەڕێینەوە لای یەكەم مەفرەزەی 26 كەسیەكەی حاجی ئۆمەران ،تا ڕادەیەك ساغ بوونەوەی ناسنامەیان دەبێتە ساغ بوونەوەی ئەو حیزبەی كە خاوەنی دەست پیكردنەوەی شۆڕشی نوێیە ،بەو

مەرجەی ڕێنمایی ئەو حزبەیان پیگەیشتبێ وبەو کارە هەلسابن ، ئەو زانیاریانەی خوارەوە (مەوسوعە)لەوانی وەرگرتوە:

لە ڕاستیدا دەرچوونی ئەو 26 کەسە بۆ شاخ بە ڕێنمایی هیچ حزبێك نەبوو وەك خۆیان سەربردەکەیان تایبەت (بەو مەوسوعەیە)گێڕایتەوە،ئەوانە بێناز لە ژیان ماون زانیاری ووردی زۆریان لایە ،دەکرێ ڕاستەوخۆ بیان دوێنین، ئەوانە لە ئەنجامی زولم وزۆری حزبی بەعس دەرچوون ،هەروەك رۆژنامەی (خەبات) یش دان بەوە دەنێ لە ژ:3782ی رۆژی 26ی ئایاری 2011،خۆیان سەرکردەیان بۆ خۆیان دیاری کردبوو وەك مونەزیر(احمد نبی) بوەو (علی نبی- علی کۆ)ش وەك واجیهە وادیارە حاجی شیخە بنزیریش رۆلی بنچینەیی هەبوە، ئەوانە دەلێن یادی شۆڕش 26ی گولان نیە بەلکو 24ی مانگ دەرچووین ،لە 26ی مانگ یەکەم شەهیدمان دا (سید عەولا)لەگەل دوو بریندار، بەشێکی تریان (حاجی شێخە)بە براگەورە هەژماردەکا،ئەوانە دەلێن یەکەم پەیوەندی وڕاوێژی دەستەی گولان بە عمر دەبابەو علی عسکری بوە، یەکەم سەردانیشیان بۆ ئەو ڕاوێژە لە 1975/8/28 شیمحەمەدحاجی ئۆمەرانی وحاجی شیخە چووینە بەغدا لەرۆژی 30ی مانگ ئەوانەیان بینیوە ، بۆ دوەمین جار لە 1976/4/5 دووبارە دوا ڕاوێژیان پێکردۆتەوە[1461] ،لە (ل24 هەمان کتیب- سەرەتای شۆڕشی نوێ سالی 1976 چۆن دەست پێکردەوە ) دەلێت هەولمان داوە نامەیەك بۆ مام جەلالیش بنێرین لە سوریا ، دوای هەولی تریان داوە بەتایبەتی لەدوای دەرچوونیان ڕێنماییان لە ئیدریس بارزانیش وەرگرتوە ،دەشلێن لەگەل دەرچوونمان نامەیەکمان بۆ مەلا مستەفا نارد بە(مام کاکۆی شیناوێ) هەوالی دەست پیکردنەوەی شۆڕشمان پێڕاگەیاند،ئەویش دەست خۆشیەکی گەرمی لێکردین بەوەلامی نامەکە، دوای لە لە 1976/8/16 عمردەبابە هاتۆتەلایان وەك سەرکردەی خۆیان قەبوولیان کردوە -ل37، بەپێی ئەو نوسراوە لەسالی 1977 کێشەی ساغبوونەوەی (تۆ لەگەل ئێمەی یان لەگەل پارتی) هاتە مەیدان، لە بارەی ئەوەی ئاخۆ وەك (پ د ك) هیچ جم وجۆلیان هەبوو ئەوانە دەلێن تەنهابیستبوومان لە نەغەدە سەرکردایەتیەکی کاتی دروست ببوو، بەلام دژ بە ملامستەفاوئیدیس بارزانی بوون، لەلای د محمودیش بەناوی(پارتی—لیژنەی

---

[1461] مەلا شیمحەمەدی حاجی ئۆمەرانی —سەرەتای شۆڕشی نوێ سالی 1976 چۆن دەست پێکردەوە ل18-19 .

ئامادەكاری)ئەویش دژی بنەماڵەی بارزانی وەستا ،لەلای شامیش باس لە جم وجۆلی مام جلال دەكرا بێئەوەی زانیاریەكی تەواومان هەبێت ،ئەوەی گەرم بوو لای بەغدا علی عسكری ودكتۆر خالیدوعمردەبابە هەبوو، ئەوان دەڵێن سەرەتا خەڵكی لەزوڵم وزۆری بەعس یاخی دەبوو باسی حزب ورێنمایی نەبوە ، دوای خەڵكێكی زۆر لە ناوچەكە هاتنە ڕیزی شۆڕش ولەناوچەی شارەزورو زۆر ناوچەی تر پیشمەرگە سەری هەڵدا، بە هیچ ناوێك نەبوو،دەڵێن وەك سەركردەكان یەكەم جار علی عسكری ودكتۆر خالید وسید كاكە وسعدی گچكە هاتنە دەر لە 8/23ی هەمان ساڵ واتە 3مانگ دوای ئێمە هاتنە دەرەوە، ئەوان بوونە سەركردەی مەیدانی هەمو لایەكمان،علی عسكری لەگەڵ ئیدریس بارزانی زۆر دۆست بوون بۆیە هەست بە هیچ حەساسیەتێك نەكرا ،تەنانەت لە 24/ 11/ 1976 د كمال كركوكی هاتە لامان لە ئاشقولكە نامەیەكی ئیدریس بارزانی بۆ علی عسكری هینا ،لەوێ كۆبونەوە كرا، لە مانگی 10ی هەمان ساڵ دەنگ وباسی هاتنی مام جلال بۆ لۆلان پەیدا بوو (علی كۆ) چوە دیدەنی لەكۆتایی بوهاری 1977،دوای لە مانگی 12ی 1977 لەگەڵ كاك نەوشیرەوان گەیشتنە قەندیل یەكسەر گرژیش پەیدا بوو، ئینجا ئێمە تیگەیشتین شۆڕشی ئەوجارە یەك سەركردەو یەك تەوجیهو یەك هیزی پیش مەرگە نیە،دەڵێن بەو هۆیەوە ئێمە(بیجگە لە حاجی شیخە) شۆڕشی نوێمان بەجێهیشت لە1977/10/18،مانەوەی حاجی شیخە جاریكی تر پارسەنگی (ی ن ك)بەهێز دەكات كە ئەوان خاوەنی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بووبن ، دەڵێن: لەدوای ئێمە كارەساتی هەكاری بەسەردا هات وهەمو پەرش وبلاو بوون ،بەشیكی زۆرمان لێ تەسلیم بوونەوە بیجگە لە شەهیدیش،..

لەلای سەركردەیەكی تری پیشمەرگە (كە بە ڕاستگۆیی ناوی هەیە)لە كتیبیكی بەناوی(بیرەوەری پیشمەرگەیەك) سیدكاكە دەڵی دوای رووخانی شۆڕش مسعودبارزانی پێی ووتین كە شۆرش دەست پیدەكەینەوە بەڵام زۆر چاوەڕێ بووم دەنگی نەبوو بۆیە ڕووم لە عیراق و ئەوانەی پێیان دەووترا جلالی لەوان كرد ل107 ، لە ل120 قیادەی موەقەتەش دژی بنەماڵەی بارزانی و شۆڕشی ئەیلول بوون . لەدوای كۆنگرەی 9 ئینجا سەركردایەتی كاتی كەوتەوە ژێر دەستیان ئەوجارە بەسەرۆكایەتی كاك مسعود، كەواتە تاڕادەیەكی چاك دەتوانین بڵێین:

1. سەرکردایەتی کاتی و(پ د ك)ی ئیستا زۆر لێك جیایە،مێژووی پارتی ئیستا لە کۆنگرەی 9ی سالی 1979 دەست پێدەکا، ئەوەش تێگەیشتنمان لەو فەترە مێژوە زۆر دەگۆڕێ چ بۆ شۆڕش دەست پێکردنەوە چ بۆ هەندێ ڕووداوی ئەو سەردەم،کەواتە ئەو گۆتانەی گوایە بە فەرمانی بارزانی یان ئیدریس بارزانی علی عسکری شەهید کراوەو (مرۆڤی مەزن دەبێ بە چەکی مەزن بکوژرێ)..ڕاست نەبێ[1462].
2. سەرکردایەتی ئەوەی ئیستای یەکێتی زیاتر مەیدانی بووینەو لە شۆڕشی نوێ ئامادە بووینە.
3. گەڕانەوەی مام جلال و نەوشیرەوان مستەفا بۆ کوردستان بوێریەکی گەورەو ئومیدی زۆر مەزنی بۆ هەمولایەك هێنا لە هەمان کات هەرگەیشتنە کوردستان ئەو جیاوازیەی حزبەکان دروست بوو ،بەلگە بۆ ئەو ڕاستیە بەیانی تەئسیسی (ی ن ك) هیرشی توندی بۆ سەر پارتی وبارزانی تێدا بوو ،هەندێکی بە عربیەکەی وەك خۆی: ((وأثبتت فشل القيادة العشائرية البرجوازية في قيادة الكورد مجدداً ..وأن دوائر الاستعمارية وعلى رأسها الأمبريالية الأمريكية أعداء ألداء الشعب الكوردى)) ((..مثلما أكدت الأحداث أعقبتها عجز القيادة العشائرية البرجوازية اليمينية المساومة وفشلها في قيادة الكورد..)) .

هەرچی کۆی ئیفادەی (مەفرەزە 26 کەسیەکەیە) بۆمان دەردەکەوێ کە:

4. ئەوان بە تەوجیهی هیچ لایەك دەرنەچووینە.
5. لەسەر بنچینەی ئەو مەفهومەی مەلا مستەفا گەورەی هەمولایەکە شۆڕشیان دەست پێکردۆتەوە ،لە ڕاستیشدا بارزانی زۆر خۆشەویست بوو هەتا لە کاتی شکستیش هەر میلەت دەوری چۆل نەکرد.
6. سەرکردایەتی (مەلامستەفا و کاك ئیدریس و کاك مسعود)لە کەرەج بووینە شای ئیران بواری جم وجۆلی سیاسیان لیگرتیوون .

---

[1462] عبدالمصور بارزانی لە کتیبەکەی (المسأله الکوردیه ..)دەلێت ئەوە فەرمانی سامی عبدالرحمن بوو .

7.بەو شێوەیە بەڕوونی دەردەکەوێ ئەو مەفرەزەیە لەچوارچێوەی ڕێنماییەکی حزبی یان لە چوارچێوەی ڕێکخستن دەرنەچووینە ،بە پالنەرێکی گشتی نیشتمانی وهەندێ ڕووداوی لۆکالی دەرچووینە ، کاریگەری هەرە گەورەیان ئەو ڕێچکەیان شکاند کە بلێن شۆڕش ناکرێتەوە ،بۆیە چەند مەفرەزەیەکی تر بەهەمان ماهیەت دەرچوون ورێخۆشکەرە بۆ سەرهەلدانەوەی شۆڕشی نوێ بە خێرا تر ،هەربۆیەش پێویستی بە لێکۆلینەوەی زیاترە تا بزانین بڕیاری سیاسیەکە لە کام لابوە؟ دەبێ بگەڕێینەوە سەر بەلگەنامەو خۆئامەدەکردنی ئەو حزبانەی کە ئیستا پاگندەی هەلگیرسێنەری شۆڕشی نوێ دەکەنەوە .

<u>وەسیقەکان چی دەلێن</u>: لە ڕاستیدا ئەوانەی سەروو سەربردەی مێژوویی زۆر بە کەلکن بەلام لە ئاست توێژینەوەی ئەکادیمی زیاتر وەسیقەو بەلگەنامە دەخوات، دەست پێکردنەوەی شۆڕشی نوێ مادام بە نەخشەو پلان بووبێ ئەوادەبێ  ئەو یادانە بەیانیان هەبێ ،کەچی جگە لە (ی ن ك) هیچ بەیانێك نیە ئەو بەروارانە بسەلمێنێ،ئەویش یەیانی تەئسیسی (ی ن ك)ە لە 1ی حوزەیرانی 1976 لەوەوە مێژوو لە قازانجی (ی ن ك) دەبێ ،بەلام دەبێ بزانین ئەوەش بەیانی هەلگیرسانی شۆڕش نیە بەلکو بەیانی دامەزراندنی (ی ن ك) ە .

لەلایەکی تریش ناتوانین ڕۆلی (پ د ك)لە گۆڕەپان فەرامۆش بکەین ،مادام لەبەیانەکەدا بە توندی هێرشی کردۆتە سەری مانای ئەوەیە هیشتا چاوەڕێی جموجۆلی سیاسی وسەربازی لێوەکراوە ،هەرچی لەلای (پ د ك)ە هیچ بەلگەنامەیەکمان نیە وەك ئەو بەیانەی (ی ن ك)گوزارش لەدەست پیکردنەوەی شۆڕشی نوێ بکاتەوە ،تەنها ئەو بەیانەی کە لە 1975/12/10 دەرچوە بە ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان –سەرکردایەتی کاتی بەسەرۆکایەتی سامی عبدالرحمن) ،لەگەل ئەو بەیانەی دامەزراندنی (پ د ك-لیژنەی ئامادەکاری بەسەرۆکایەتی دکتۆر محمود) باسی شۆڕش هەلگیرسانەوەی تێدانیە ،بەلام ئاڕستەی شۆڕشی نوێ بە تازەیی و مۆدیرن ودوور لە سەرکردایەتی پیشوو گوزارش کراوە ،ناوی مەلامستەفا وئیدریس بارزانی ومسعود بارزانی تێدا نەهاتبوو  ،لە هی دوەم بەخراپی هاتوە، بۆ ئەو مەبەستە ڕاشکاوانە ترسەیدکاکە لەبیرەوەریەکانی خۆی باسی کردووەو دەلێ : سەرکردایەتی

کاتی دژایەتی شۆڕشی ئەیلوولیان دەکرد، خەریکی کتێبی سووری ماوی بوون، لە کێشەکەی هەکاری سەیدکاکە دەڵێ بە (سامی عبدالرحمن)م ووت ئێمە رێکەوتنمان لەگەڵ ئیدریس بارزانی هەبووە، لەوەڵامدا ووتی:چۆن ئێوە لەخۆتانەوە ئیدریس بەبەرپرسی ئێمە دادەنێن، ئێمە سەر بە ئیدریس نین، هەربەو شێوەیەش لەو کاتی سید کاکە نامەی بۆ مسعود بارزانی نوسیوەو ئەو ڕاستیانەی بۆ ڕوون کردۆتەوە[1463]، لەلایەکی تریش (د محمودعوسمان لە: الحزب الديموقراطی الكوردستانی –اللجنة التحضيرية –تقيم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها) دەڵێت (ی ن ك)شۆڕشی دەست پێکردۆتەوە ، بەهەمان ئاڕستە عبدالمصور بارزانی لەکتیبی( المسألة الكوردية –بديل الديمقراطی ..1974-2009) دەڵێت لەکاتی ڕووخانی شۆڕش زۆر هەولمدا هەندێ چەك بشارنەوە هەموی تەسلیم نەکەنەوە دیاربوو نیازی هەلگیرسانەوەی شۆڕش یان بەردەوامیان نەبوو ،لە هەمان سەرچاوە ئەویش دەلێت سامی عبدالرحمن دژایەتی بنەمالەی بارزانی دەست پێکرد کاتێ لەڤیەنا بینیم .

ئەوەیان کورتە توێژینەوەیەکە بۆ ئەوەی بتوانین بڕیاڕی کۆتایی(بڕیاڕی ئەکادیمیانە) بدەین کام حزب خاوەنی شۆڕشی نوێیە ،هیشتا پیویستمان بە بەلگەو توێژینەوە زیاترە ، بەلام بەپێی واقعی مێژوویی ڕەنگە ئەو بڕیارە زەحمەت نەبێ (وەك لایەنگرانی ی ن ك دەلێن)دارو بەردو شاخ وڕووبارەکان ، گوندەکان..تا دەگاتە بەلگەنامەی دوژمنانی کوردیش دیارە کە کام لا پیشڕەو بووینە ، هێشتا پێویستی بە توێژینەوە هەیە بۆ بڕیاڕی ئەکادیمی .

---

[1463]بڕوانە کتێبی : بیرەوەری پێشمەرگەیەك –سەید کاکە، ب2 ل113- 165.

**(52)**

## سیستەمی سیاسی کوردستان النظام السياسي الكوردستاني Kurdistan's political system

**ئەوانەش دەگرێتەوە**(ئەزمونی کوردستان ،سیستەمی سەرۆکایەتی، سیستەمی پەرلەمانی ، حکومە الرشیدە ،میریتۆکراسی،نۆمۆکراسی..)

بەهەموو ئەو دام و دەزگا سیاسی و یاسایی و سەربازی و پەروەردەوفێکردن لە کوردستان بەرپا بوە لەدوای (ڕاپەرینی 1991 و هەڵبژاردنی 1992) دەوترێ سیستەمی سیاسی کوردستان، واتە فراوانترە لە حکومەتی هەرێم، گەلێ جار چەمکی ئەزمونی کوردستان بەکاردێت ئەوەش کەمێك فراوانترە و تەواوی (ژیانی سیاسی و حیزبی )کوردستان دەگرێتەوە، هەندێ لەیاساناسانی نێودەوڵەتی و هەندێ بەرپرسانی عێراقیش پێیان وایە ئەو سیستەمەی لەهەرێم ئیش دەکات فراوانترە لەدەسەڵاتی هەرێم و فیدراڵی لەچوارچێوەی دەستور،پێیان وایە فیدراڵی تەنها حکومەتی لێ پەیدا دەبێت، هەرچی دۆخی یاسایی کوردستانە سیستەمێکی سیاسی لێپەیدا بوە، لەسەرۆکایەتی هەرێم و فەرمانگەکان و سیستەمی بەرگری و ئاسایش لەگەڵ هەرسێ دەسەڵاتی فراوان و ئەکتیڤیەتی خەڵکی کوردستان و چالاکیە ئابوریەکان لەسەرووی فیدرالیە، جاریش وایە دەڵێن لەسەرووی دەولەتیشە لەبەر ئەوەی دەولەت نیە تا پابەند بێت بە ڕیکەوتنە نیودەولەتی وبڕیارەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان ،یەکێکە لە ئەزمونە دەگمەنەکانی جیهان .

**دروست بون و پاساوی**

لەدوای بێ بەش کردنی کوردستان لە بەدەوڵەت بوون لەسەرەتای سەدەی بیستەم چەندین شۆرش و ڕاپەرین بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە کراوە، هەرە دواییەکەی ڕاپەڕینەکەی ساڵی 1991 سەرکەوتنی بوە هۆی بینای ئەو سیستەمە، پاساوی ئەو سیستەمە لە پرسیاریکی سەرەکی دێت کە ڕوو لەو میللەتانە دەکا کە خەریکی خەباتی بەرگرین بۆ مافی چارەنووس، پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی وەك هاولاتی ناژین لەو وولاتە وەك ولاتانی ئەورووپی کەزۆربەیان فرەنەتەوە و پێکهاتەن؟بۆچی خولیای

بەدەست هێنانی سیستەمیکی سیاسی سەربەخۆن ،بۆ ئەو سیستەمە لەدەولەتە داکانەکە نادۆزنەوە .. هەر خودی وەڵامی ئەوپرسیارە زەمینەی یاسایی و سیاسی و نیشتیمانیە بۆ بزوتنەوە ڕزگاری خوازەکان دروست دەکات، زیاتر لەوەش بۆ خەباتی چەکداری دیتە کایەوە، وەلامی ئەو پرسیارە بە نمونەی سەرهەلدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لە عیراق (وەك نمونە)وەرگرین لەپێشدا دەبێ ئەوەی ڕوون بکەینەوە کە دەوڵەتی عێراق مێژووی سیاسی نیە، دروستکراوە لەچوارچێوەی پرۆژەی ئیستیعماری لە رۆژهەلاتی ناوەراست، لەڕوی سیاسیەوە کوردستان لەعیراق ڕەسەنترە، دەوڵەت و میرنشین و ویلایەتی هەبوە، کەچی دابەشیەکانی ئیستعمار لەرێکەوتنی سایکس بیکۆ 1916 و لۆزانی1923 وای خواست ژێراو ژوری سەرخان و بنخانی ناوچەکە بکرێت، بەپێ ی کۆمەلێك مەرج کوردستان لکێندرا بە عێراق،بەکورتی سەربردەکەی ئەوەیە:

ئیستعمار دابەشی کرد زولمێکی گەورەی لەکورد کرد کەچی لەگەڵ ئەو زولمە هەندی مافی بۆ دیاری کرد، وەك ماددەکانی سیڤەر، ماددەی (16)ی ئینتداب، راسپاردەکانی ویلایەتی موسل، ڕاسپاردەی عوسبە، - بەلێنامەکانی عێراق بۆ عوسبە، ..زۆری تر، لەکوردستانی تورکیاش ئەتاتۆرك ئەو هەموو بەلێنەی دا ،کەچی نەك هەر جێبەجێیان نەکرد بەڵکو رۆژ بەرۆژ خراتر دەبوون، ئینجا وولاتانی وەك عیراق وتورکیا هەولیان داوە کورد لە نێو عەرەب وتورك بتوێننەوە هاولاتی پلەیەك و پلە دوو..تا گەیشتە ڕادەی تەعریبی ڕێکخراوهاتە دی، لەدوای هەموو ئەوانەش گەشەو نەشونمای کوردستان و تاکی کورد سست کرا .

کەواتەبە ڕوونی دەردەکویێ کورد کێشەی دروست نەکردوە بۆی دروستکرا.. بەو شێوەیە کورد پەنای بردۆتە بەر شاخ و کۆنەچەکی سەدەکانی (18) و دەوڵەتی عێراقیش بە تازەترین چەك و بەپەیوەندی نێودەوڵەتی بەهێز و بەخاوەنداری سامانی نەوت و بەرژەوەندی تر وای کردووە کە کورد تەنها شاخەکانی دۆست بێت (وەك وتراوە)، شەریش لەناو خاکی کوردستان بووە، باری ئیقلیمیش یارمەتیدەر نەبوە، بۆیە زۆربەی جار ڕووبەڕووی شکست بوە، لەچوارچێوەی شۆرشەکانی شێخ مەحمود تا 1932 دوایش شێخ ئەحمەد ئینجا مەلا مستەفا تا دەگاتە شۆرشی نوێ بەسەرکردایەتی ( ی ن ك) و ( سەرکردایەتی کاتی پ د ك) ،ئەوجارە بەچەکی زۆر کاریگەرتر قڕی کورد کرا بەچەکی

کیمیای و وێرانی گوندەکان کرا، لەگەڵ وەستانی جەنگی عێراق و ئێران لە قازانجی عێراق گورزی کوشندە لەشۆرش دراو ناوچەکانیان پێ چۆڵکرا، ئەوەی لە 1975 ڕویدا دوبارە بۆوە ئەوجارە بەچەکی کیمیایی و ئەنفال و وێرانی لەکۆتاییدا هەموو کوردستان لە نزیکەی 90 کم دووجا کۆکرایە بۆ هەنگاوێکی پڕ مەترسیدار، بەپێ ی هەندێ راپۆرت زۆربەی لایەنەکانی جامیعەی عەرەبی یارمەتیدەری حزبی بەعسی عێراق بون بۆ ئەوەی نەخشەی کوردستانی عێراق بکوژێنێتەوە، کوردیش دابەش بکا بەسەر وڵاتانی عەرەبی.

**هەنگاوێکی لەناکاو:** لەگەرمەی سەرقالی بە دابەشی وکوژاندنەوەی ناوی میلەتێك کە خوای گەورە بە(شعب) دروستی کردوون ، لەو کاتە کێشەیەك هاتە پێش، ئەویش کێشەی عێراق لەگەڵ کوێت و لەکۆتاییدا بوە هۆی ئەوەی لە 2-8-1990 سوپای عێراق کوێتی داگیربکا، ناوچەکە بەتەواوی کەوتە وەرچەرخانێکی گرنگ، ئیتر عێراق کەوتە ژێر سزا و هەڕەشە و دوایش پرۆسە سەربازیەکە، زنجیرەکە بەو شێوەیە دەستی پێکرد: عێراق کەوتە ژێر بەندی حەوتی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان بە پێی دانیشتی ژ:3933 ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتەوەکان بە پالپشت بەبەندی7تیایدا بڕیاڕی 661ی رۆژی 1990/8/6 دەرچوو. کەبە بڕیاری 661ی 1990 ( ئابلوقەی ئابووریەکە) دەست پێدەکات ،پشت بەمادەی39ی بەندی حەوتەم دەبەستێت ،باقی بڕیارەکانی تر پالپشت دەکاتە سەر ئەومادەیە تا ڕادەی جەنگیش ، بەو پێیەهاوپەیمانیەکی 32 وولاتی بەسەرۆکایەتی ئەمریکا دروست بو دژ بەعێراق، تا لە شەوی 18/17/ 1991/3 پرۆسەی سەربازی دەستی پێکرد دژ بە عێراق و لەکوێت دەرکرا.

لەگەڵ ئەو شکستەی یەکەم پروسکەی ڕاپەرین لەبەسرا هەلگیرسا بوە هۆی ڕاپەرین لەسەرجەم ناوچە شیعیەکان، ئەو ڕاپەرینە و شکستە سەربازیەکەی عێراق بوێری بەکورد دا ئەویش ڕاپەرین بکا، لە 6-3-1991 یەکەم گلپەی ڕاپەرین لە ڕانیە دەستی پێکرد و هەموو شارەکانی گرتەوە بەسەرکەوتوویی، دوای ئەوەی عێراق توانی ڕاپەرینی شیعەکان دابمرکێنێتەوە ڕووی لە کوردستانیش کرد ئەو ڕاپەرینەی دەربەدەرکرد و کۆچە ملیۆنیەکەی لێهاتەدی، لەوەوە بڕیاری 688 لە5ی نیسانی 1991دەرچوو، ئینجا هێلی 36 بۆ دژە فرینی عێراق وکە بوونە بنچینەیەکی یاسایی دەولی بۆ

بنیاتنانی سیستەمی سیاسی کوردستان .. وای لێهات پەلامارە گەورەکەی عێراق تەواو نەکرا جارێکی تر هێزی پێشمەرگە توانیان بگەڕێنەوە ناوچەکانی سەروو هێلی 36 ،لە چوارچێوەی دانوستانێك،هەر سێ شاری سلێمانی و هەولێر و دهۆك کەوتەوە ژێر کۆنترۆڵی شۆرش وحکومەت بەهاوبەشی ، لای کورد ئیدارەکە ڕادەستی بەرەی کوردستانی کرا،ئەو ئیدارەیە هاوبەشیەی حکومەت وبەرە زۆری نەخایاند، حکومەتی عێراق تا لە1991/10/23کشایەوەو ئابلوقەیەکی ئابووری وئیداری ویاسایی خستە سەر کوردستان ، بەتەواوی ئیدارەکە یەکلابویەوە بۆ بەرەی کوردستانی ، ئا لێرە سەرەتای یاسایی و سیاسی بۆ سیستەمی ئێستای کوردستان دروست دەبێت.

**ئەزمونی کوردستان:** دوای رێك نەکەوتنی لایەنە کوردستانی هەموو لایەنەکان لەسەر ئەوە رێکەوتن کە هەڵبژاردنێکی سەرەتاسەری بەدیموکراسیانە بکەن لە 1992/5/19کراو لە 1992/7/5 یەکەم حکومەتیش دروست کرا ، یەکەم ئەزمون بوو ،لەچاو ئەوەی لەشاخ ولەشار پڕکێشی شەڕە دەسەلات بوو ئەنجامەکی بەدەست هێنا لەسەر هەردوو ئاستی لیست وسەرۆکایەتی ،دەرکەوت کە (ی ن ك)لەسەربازی وسیاسی و زۆرلای تر لەپێشە لە هەلبژاردن لەپێش نیە ،ئەوە ئەنجامە کۆتاییەکان بوون:

1-( لیستی زەرد) پ.د.ك: 337879 کە دەکاتە 45.2٪. یەکەم دەنگی هێنا .

سەرۆك:**مسعودبارزانی** 466819 کە دەکاتە 48.3٪.

2-( لیستی سەوز) ی.ن.ك +(زەحمەتکێشان): 423933 کە دەکاتە 43.8٪. دوەم دەنگی هێنا،

سەرۆك: **جلال** تالەبانی 441057 کە دەکاتە 45.6٪.

3-لیستی (سەوز و سپی) ئیسلامی، (یەکگرتوو+بزوتنەوە): 49108 کە دەکاتە 5.08٪.

سەرۆك: عوسمان عبدالعزیز 38815 کە دەکا 04٪.

4-حسك(شین): 24882 کە دەکا 2.5٪.

سەرۆك: د محمود عوسمان23342 کە دەکا 2.4٪.

5-ح.شیوعی عێراقی: لیست:21123 کە دەکا 2.1٪.

6-پارتی گەل: 9903.

7-بێ لایەن: 501 دەنگ.

جگە لە پارتی ویەکێتی باقی حزبەکانی تر دەنگی وایان نەهێنا بگەنە کورسی کە ریژەی 7٪یان بۆ دانرابوو، بەو شێوەیە هەریەکە لە بزوتنەوەی ئیسلامی وسۆشیالیست وحزبی شیوعی کورسیان نەبوو ،لیستی زەرد یەکەم دەنگی هێنا بە زیادی (14042) دەنگ کە دەکاتە رێژەی 1.4٪ لە سەرۆکایەتیش (25672) دەنگی زیادی هێنا،(ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی قایل نەبوو، لەو کاتی (پ.د.ك) تەنازولی لەو برە زیادە دەنگەی کرد، رێکەوتن کە ئەنجامەکەی جارِ نەدرێت، دەسەلات بۆ هەریەکەیان (50بە50) بێ،بناغەی دەسەلاتی کوردو ئەزمونی پەنجا بەپەنجا لیرەوە دێت،سەرۆکی پەرلەمان بۆ پارتی وسەرۆکی حکومەتیش بۆ یەکێتی ،بەهۆی ئەکتیڤ بوونی یەکیتی وای کردسیستەم بەرەو سەرۆکایەتی برِوا نەك پەرلەمانی ئیتر لەو کاتیەوە بناغەی پەنجابەپەنجاو سیستەمی سەرۆکایەتیش خەملی، تا هەڵبژاردنی نوێ و ناوی لێ نرا پەرلەمانی ئینتقالی،دوای بوە ئەسلی ، پەرلەمانێکی (111) ئەندامی دروست بو، سەرۆکەکەی وەبەر ( پ د ك) کەوت (جەوهەر نامیق سالم) ،حکومەتیش دروست بوو سەرۆکی حکومەت (د .فوئاد مەعسوم) وەبەر ( ی ن ك)،دوای (ی ن ك) کۆسرەت رەسولی هێنا جێگەی د فوئاد ،دوای شەرِی براکوژی نێوانیان هەلگیرسا، درێژەی کیشا بوو بو دوو حکومەت ،تا لە 2002/10/4 جارێکی تر پەرلەمان بە هەموو لیستی بەشدار کۆبوونەوە و (ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی ساڵی 1992 قایل بۆوەو کە (49٪) کورسی هەبێت و (51٪)یش بۆ (پ.د.ك)،بەلام دووحکومەتەکە هەر بەردەوام بوو ، دوو حکومەت لە سلێمانی و هەولێر، تا داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە و پرسی بودجە ناچار هەموو حکومەتەکە بە رِواڵەت یەکی گرتەوە و نۆرەی قۆناغێکی نوێ لە سیستەمی سیاسی هەرێمی کوردستان دێت –کە لەخواروو باسی دەکەین .

**ڕەگی یاسایی و سیاسیەکەی(لە بابەتی فیدرالی باس کراوە )**

رەگی هەرێمە جیاکان لە عیراق: هەرخودی دروست کردنی عیراق لە 3 ویلایەتی سەرەکی دیت ، ویلایەتەکانی شارەزور(یان ویلایەتی موسل) و ویلایەتی بەغداو ویلایەتی بەسرە ،لەدوای ئەو هەنگاوەش :

1- لەگەڵ دروست بوونی دەوڵەتی هاوچەرخ بناغەی سێ دەوڵەت لەخوارووو (کەربەلا 1918-1920)و ناوەڕاست (بەغدا 1920-...) و لە کوردستان (سلێمانی 1918-1923) دروست بوو.

2- تەقەلاکانی دروستکردنی هەریمی جیاجیا لە خوارووو: أ- پرۆژەی لۆرانس بۆ سەربەخۆیی بەسرە، پرۆژەی لکاندنی بەسرە بە دەسەلاتی هندەوە، پرۆژەی هەرێمی بەسرە بە سەرۆکایەتی تالیب پاشا، دوابیش پرۆژە بە ناوبانگەکەی 1921/6/13ی خەلکی بەسرە لە کەسایەتیە بەناوبانگەکان ومەسیحی و یەهودیشی تیایدا داوایان کردبوو سەربە خۆیی بدرێتە ویلایەتی بەسرە[1464] .

ب- تەقەلاکانی (فراتی ناوەڕاست) کە بریتین لە: حکومەتی کەربەلا، شۆڕشی (20)، ج-تەقەلاکانی ئایەتولاکاشف غیتا، هاوپەیمانی فراتی ناوەڕاست و بەکر سدقی، بەگشتی هاریکاری رابەرانی شیعە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحمود، مەلا مستەفا.

3- نەگونجانی سێ پێکهاتەکان لەژێر سایەی دەسەڵاتی مەرکەزی، سەرهەلدانی پشێوی لە نێوانیان..،لەکوردستانیش بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود تاساڵی 1932ی خایاند،،بزوتنەوەی شیخ ئەحمەد، ئینجا لەساڵی 1935 بزوتنەوەی بەکر سدقی لەشێوەی ئینقلاب لە بەغدا رویدا بۆ گێڕانەوەی مافی سروشتی کوردستان، دوای جەنگی جهانی دوەمیش سەرهەڵدانی حزبە کوردستانیەکان و شۆڕشی ئەیلول و... لەوکاتی تا ئیستا دیاروزانراوە.

---

[1464] بروانە :عبدالرزاق الحسنی –تاریخ الوزارات ج1 ص100.

هەمو ئەوانە بنەماوبنچینەیەکی قوول بۆ سیستەمی سیاسی ویاسایی کوردستان دیاری دەکات ،لە ڕوانگەی مونەزیرانی کوردستانی بۆ دروست بوونی برایەتی ڕاستەقینە، کوردستان ئەوا هەریەکەو مافی چارەنوسی لەدەست خۆی بێت ،یان دەوڵەتیکی هاوبەشی ڕاستەقینە (بە مانا یاساییەکانی هاوبەش)کوردی ـ عەرەبی ـ یا خود باشتر لەوەش لە هەر سێ پێکهاتە(شیعە —سونە —کورد) پێك بێت لەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەوترێت عیراق  لەسەر بنچینەی ڕێکەوتنی ئارەزوومەندانە، مافی تورکمان وئاشوریو ئەوانی تر ڕەچاو بکرێت، تیایدا ناوی دەوڵەت وئالاکە وەك (چیکۆسلۆڤاکیا) گوزارش لە هەرسێ پێکهاتە بکا لەدابەشی دەسەڵات و دەستور... بۆ ئەوەی لایەك زال نەبێ بەسەر لایەکی تر، ئەو ڕێکەوتنە لەدەستور زامن بکری و نەتەوە یەکگرتووەکانیش لێی بەرپرسیار بن ، هەریەکەو سیستەمیکی سیاسی حوکمی خۆی هەبێت لە چوارچێوەی عیراق کە سیستەمی سیاسی کوردستانیش بەشێك دەبێ لێی .

## ناسنامەوجۆری  سیستەمی سیاسی کوردستان

لەسەر وەسفی خۆی سیستەمێکی دیموکراسی فرەییە ، مەدەنی ویاساییە ،ڕەچاوی مافەکانی مرۆڤ دەکا، حکومەتیکی ئیئتلافی وبەبەشداری پیکهاتەکانیشەوە ..،بەلام وەك زۆربەی وولاتانی عربی لە پیادەکردنا جیاوازیەکی زۆری هەیە ،ئەگەرچی تاڕادەیەکی چاکیش هەنگاوی مەدەنی ودیموکراسی بڕیە، لەبارەی ئەوەی ئاخۆ سیستەمەکەی سەرۆکایەتیە یان پەرلەمانیە لەورووەوە خۆیان بە ڕوونی نەناساندوە ،هەردوولای پێوە دیارە ،بەلام زیاتر بەلای سەرۆکایەتی بوە بەپێی ئەو هەمو دەسەلاتەی دراوەتە سەرۆکی هەریم بە پێی ئەو 19مادەیەی یاسای سەرۆکایەتی هەرێم .

ناسینی لە ڕێی پیادە: دوو فەترەی بنچینەی لە میژووی سیستەمی سیاسی کوردستان بەدی دەکرێت ،فەترەی یەکەم لە دابەشی پەنجا بەپەنجاکە زۆر جیایە لە فەترەی دوەم کە معارەزەی ڕاستەقینە سەرهەلدەداو بەشداری پەرلەمان وحکومەت دەکا،بەگشتی لەکوردستان یەکەم هەنگاوی هەلبژاردنی پەرلەمانی دەکرێت ئینجا دام ودەزگای تری تنفیزی دیاری دەکرێت ،لە سیستەمی دیموکراسیدا

عادەتەن دەسەڵاتی پەرلەمانی  یەکەمە، کەچی لێرە بێدەسەڵات بووبەتایبەتی لە فەترەی پەنجا بەپەنجای هەردوو حزب ، لەژێر ڕێنمایی (م.س) بووە، وەك وولاتانی عربی پیشوو هەردەم یاساو بڕیارەکان بەکۆدەنگ یان سفر بووە،دوای بەشداری موعارەزە لە پەرلەمان وحکومەت تاڕادەیەکی باش بەرەو دیموکراسیانە ڕۆیشتوە .

هەرچی حکومەت ودام ودەزگاکانی ترە ئەوانیش لەو فەترەیە بریتی بوو لە حکومەتی حزب، هەریەکە لەلای خۆی نەی دەشاردەوە کە حکومەتی حزبە،جاروایە بەو جۆرە سیستەمە ووتراوە پارتۆکراسی ،هەروەك لە (فەرهەنگی سیاسی ئارشی فارسی) بەو سیستەمانە ووتراوە(پارتۆکراسی) کە حزب زالە ،زیاتر لەسەردەمی تاك حزب وحزبی سەرکردەی کۆمەنیستەکان هاتە کایەوە ،بەو دواییە بە دیموکراسی حزبیش ووتراوە[1465] ،لەلایەکی تریش بە سیستەمی (حزب القائد) داڕژرابوو، جیا لەحکومەتانی تری حزب القائدی عربی لە کوردستان هەرلایەی حزبی قائدی خۆی هەبوو ،بەو هۆیەشەوە سێ دەسەلاتەکە لێکجیانەکرابۆوە ،هەرسێکیان بە حزبەوە وەنوسابوون ، لەوەوە پرسی دەستگۆڕی دەسەڵات زەحمەت بوو ، کەچی کرۆکی دیموکراسی لەو خاڵەیە، لە کوردستان نەك دەستگۆڕی دەسەڵات نەبووبەڵکو سەرکردەکانی یەکەم لەنێو حزبەکانی خۆشیان دەستگۆڕی دەسەڵاتیان نەدەکرد، لەوەوە زاراوەی سەلبی وەك گرینۆتۆکراسی:حوکمی وولات بەدەستی پیرە سیاسیەکان لەگەل پلۆتۆکراسی حوکمی دەولەمەندەکان هاتە کایەوە ، دژبە زاراوەی (نۆمۆکراسی :حکومه القانون او دوله القانون —اوحکم القانون) .. لە بارە هەرە چاکەکەی  وەك دەسەڵاتداری عەرەب وەزیر و سەرەك وەزیر و پایەکانی تر دەگۆڕن، بەڵام بەو مەرجەی هەر خۆیان لە سەرووی هەموو گۆڕانێك بن، ئیتر پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆیان لە سەرووی ئاسایشی نەتەوەیی کورد و ئامانجەکان و نەگۆڕەکان و پیرۆزیەکان و بەهاکان..جاریش وایە بەشەخس ووتراوە (هیلی سوور) ، عادەتەن لە سیستەمی وادا شەفافیەت وگەندەلی پێکەوە قووت دەبنەوە بە پیچەوانەی یەکتر، لەو فەترەیە هەموو بوارەکانی ئیداری و سیاسی و مالی و یاسایی.. لێڵە، لە خەڵك دیار نیە زۆربەی لەژێر پەردەو بەدەر لە یاسا دەکرێ، نەك خەڵکی هەتا وەزیر و لیژنەی بەدواداچوونی ڕەسمیش تەنها

---

[1465] فەرهەنگی سیاسی(ئارشی فارسی) ل127

هەندێ ئامار و ژمارەی سادەی لایە، عادەتەن لەدۆخانە حکومەتیکی گەندەل و بەدکاری لێدروست دەبیت (Bad Governance- الحكم الفاسد) ئەگەر دەووترێ (حكومه الرخوه) ئەگەر زۆر خراتر بوو (کلیپتۆکراسی)پێ دەوترێ ، ،پیچەوانەی حکومەتی نایاب(حكومه الرشيده- Good government ) ،یان میریتۆکراسی، کە لە ئەنجامی سەروەری یاساو لێکجیاکردنەوەی دەسەلاتەکان وشەفافانە دیتەدی ،یان(نۆمۆکراسی)پێ دەووترێ ،دیویکی زاراوەی (الحوكمه – CORPORATE GOVERNANCE ) مانای بەرجەستەی حکومەتی نایاب دوور لەگەندەلی، جاران زاراوەیەکی تر هەبوو هاوتای حکومەتی نایاب،ئەویش تکنۆکراتی بووکە لە سالی 1932 لە ئەمریکا بەگەرمی هاتەوە مەیدان ، حکومەتی نایاب لە بەرجەستە کردنی جۆرە دەسەلاتیکی ئیداری وسیاسی وئابووری چاك لە پێناو هەمو ،تیایدا خەلکی شایستە لە شوینی شایستە دەبێت ،خەلکی ناشایستەش بێشوێن نابێت، بەلام لە شوینی شایستەی خۆی دەبێت ،سیستەمی سیاسی کوردستان لە پۆلینێکی مەترسیداری ئەو جۆرەی خراپەکەیە : (قالت ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها وجعلوا اعزة اهلها اذلة وكذلك يفعلون ) لە سیستەمی سیاسی وادا معارەزەی یاسایی بەزەحمەت پەیدا دەبێت ، بەلکو بەپێی (رۆبیرت مایکل )بە توندوتیژی دروست دەبێت ،زیاتر لەوەش(سارتۆری)لەکتیبی (الأحزاب وأنظمة الأحزاب) دەلێت (أن الانتقال من حكم الحزب الواحد إلى التعددية الحزبية لا يمكن أن يحدث من دون قطيعة، من دون انفجار، ما يضع حداً للسياق الأحادي ويفتتح الطريق نحو السياق التعددي) بەکوردیەکەی دەلێ سیستەمی تاك حزب وەرناچەرخێتە سیستەمی فرەیی بێتوندو تیژی وڕاپەڕین نایەتە دی، لێرە وەك هەنگاویکی ئیجابی معارەزە بەبیتوندوتیژی سەری هەلدا، بەلام کیشەی یاسای وسیستەمیان هەبوو ،لە وولاّتانی دیموکراسی معارەزەو دەسەلاّتدار وەك یەك مافی یاساییان لە پێکهاتەی دەسەلاّت هەیە، بەلاّم لە کوردستان معارەزە زیاتر تاوانبارەو ئابلۆقەکانی یاسایی و ئیداری و سیاسی و مادی و مالّداریشی لەسەر بووە، زۆر بەخێرایی توندوتیژی و تۆقاندنی لەدژی بەکارهاتووە یان بەسەربازیانە ڕاستەوخۆ یان لەڕێی دەزگاکانی یاسایی لەژێر ناو ناتۆرەی جیاجیا، بێبەش بووە لە هەموو داهات و ئیجابیەکانی ولاّت، بەلام رۆژبەرۆژ بەرەو باشیە .

**پوختەی جۆری سیستەمی سیاسی کوردستان:** ناسنامەی ئەو حکومەتەی لەو دووحزبە دروست بووە بریتی یە لە شێوە دەسەڵاتێکی زۆر دەگمەن، زۆر بە زەحمەت پۆلین دەکرێ، چونکە شێوازی زۆر کۆن ونوێی کۆکردۆتەوە،پێکهاتنەکەی بریتیە لە دیارشی - تەوافوقیەکی دەگمەن[1466]، سیستەمی پارتۆکراسیشە، لەهەر پارچەیەکی دیارشیش حزبێکی قائد هەیە ،بەو شێوە لە ولاتانی عربی یەك حزبی قائد هەبوو لەکوردستان دووحزبی قائد، لەسەرووی هەر حزبیکی قائد قائدیکی نیمچە دیکتاتۆر هەیە ، ئەوەش ئۆتۆماتیکیانە سیستەمیکی سەرۆکایەتی دروست دەکات،با سیستەمەکە ناویشی پەرلەمانی بێت ، شارەزایانی بالا پێیان وایە ناشێت بەراوردی سیستەمی سەرۆکایەتی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست وئەزمونی ئەوسیستەمە لە فرنساو ئەمریکا بکرێت ، یەکەم جار سیستەمی سەرۆکایەتی مۆدیرن لە ئەمریکا تاقیکرایەوە ،بە پێی ئەو دەستورەی فلادیلفیای سالی 1787 ویەکەم کەسیش ئەو ناوەی لەو سیستەمە نا (وولتەر باگۆهۆت) رۆژنامەنوسی ئینگلیزی بوو ، جیاوازیەکەی ئەوەیە هەموی لەدەست سەرۆکە سەرۆك وەزیرانی نیە ،وەزیرەکان سەرۆك دیاری دەکا نەك کۆنگریس[1467]، هەرچی نیمچە سەرۆکایەتیە ئەوا کەمیك لە دەسەلاتی سەرۆك بۆ سەرۆك وەزیران دەگەڕێتەوە ،بە واتایەکی تر سیستەمی سەرۆکایەتی دەولەت دەسەلاتدارە نەك حکومەت ، سەرۆك سەرۆکی دەولەتە ،لە سیستەمی پەرلەمانی سەرۆك کۆمار(کەسەرۆکی دەولەتە)دەسەلاتدار نیە ،بەلکو سەرۆك وەزیران دەسەلاتدارە کە سەرۆکی حکومەتە .

لەبارەی نواندنی سیستەمی سیاسی کوردستان بریتیە لە جۆرە حکومەتێکی بلۆتۆ کراسی ئۆلیگارشی ، دەتوانین بلێین بریتیە لەمیراتگری ئەزمونی لایەنە سەلبیەکانی یۆنانی کۆن،دەسەڵاتی ئیستای عربی ،هەندێ ڕیشەی عەشایری میرنشینەکانی خۆمان.

پێویستە لەسەر ئەوەش بوەستین سیستەمی تەوافوقی لەو وولاّتانە پیادەکراوە کە دوو پێکهاتەی جیان وەك چیکۆسلۆڤاکیای پێشوو ،قوبرس، لبنان ،عێراقی ئیستا،لەهیچ کونجێکی ئەو جیهانە نەبوە لە نێو یەك میللەت سیستەمی تەوافوقی وەك ئیستای کوردستان پیادە بکرێ ،لە شوێنان دیموکراسی

---

[1466] لە مادەی 3ی رێکەوتنامەی ستراتیژی (پ د ك) و(ی ن ك) هاتوە.

[1467] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية -د احمد سعيفان ص393

تەوافوقیە ئینجا ئاوا زەحمەتە لە کوردستان تەوافوقیەکەی خەستەو دیموکراسیەکەی کاڵە،هەڵبەتە ئیئتلاف کردن ئاساییە بەڵام تەوافوقی نائاساییەتی□شمتر .

---

[1468] بۆ لێك جیاکردنەوەی ئیئتلاف لەگەڵ تەوافوق بڕوانە :ارنت لیبهارت-الدیمقراطیة التوافقیة فی المجتمع المتعددص47-

(53)

## تایفی ( الطائفية) Sectarianism

ئەوانەش دەگرێتەوە ( کۆمیۆن، شیعەوسونە، دەولەتی تایفی ،مەزهەبی، حزبی تایفی ،ئەپۆستۆلیش..)

بەشێکە لە دابەشی دابەشکراوان، عادەتەن بە دابەشیە ناوەخۆکانی ئاینێك دەووترێ ، وەك دابەشی کۆمەلایەتیە چۆن بۆ نەتەوەو عەشیرەت وخیل دابەش دەبێت ئاینیش بە زۆری بۆ مەزهەب و تایفە دابەش دەبن ،بەو پێیە تایفە لەمەزهەب بچوك ترە،تایفەو تایفی جیان،هەرچی(قاموس المصگلحات المدنیە..)پێی وانیە ئەو زاراوە قەتیس بێت لە ئاین بەلکو بوارەکانی تریش دەگرێتەوە[1469]، ئەو کاتە تایفە(Sects)هیشتا زاراوەیەکی کۆمەلایەتی دەبێت و مۆزائیکی وولات جوان دەکا ،بەلام کە بوە تایفی(Sectarianism) وەردەچەرخێ بۆ دەمارگیری و ئینتماونیمچە ئایدیۆلۆجی وجاریش وایە تێکەلی ئامانجی سیاسی دەبێ ،بەتایبەتی بەرژەوەندی ڕابەرانی تایفەکە، تا ئەو ڕادەیە هەندێك (یان زۆر) دەمارگیری وایان بۆ دەبێ ڕقیان لە تایفە و مەزهەب و خەڵکی تر دەبێتەوە، بەو پرۆسەیە دەوترێ تایفی، زۆربەی جاریش خاوەن ئەو تایفانە رازی نین بەو ناوەو خۆیان لە ئاستی تایفە نابینن ،بۆیە تایفی تاڕادەیەك بوویتە توومەت بەرامبەر یەکتر، بەشێك دەلێن بەقۆناغی پیش تایفە دەووترێت (فرقە)،واتەجیابوونەوەی فکری ،کە بوە جیابونەوەی عەمەلی دەبتە تایفە، کەم تر هەست بەدەولەتی تایفی دەکرێ بەلام حزبی تایفی بە ئاسانی هەست پێدەکرێ ،زیاترلەو شوێنانە هەیە کە ململانێی تایفی لێ یە، لە شوێنێکی وەك لبنان هەریەکە لە حزبی مەسیحی بە هەردوو تایفەوە حزبی تایفیان هەبوو (حرب کتائب) بە سەرۆکایەتی بنەماڵەی پیێر جومەیل، حزبی (الوطنین الاحرار) بە سەرۆکایەتی بنەماڵە کمیل شمعون، هەروەها حزبی سوننی و شیعی هەیە (حرکە أمل)، حزبی دورزی- هەرچەندە ناویشی سۆشیالیستە (حزبی سۆشیالیستی پێشکەوتوو- بنەماڵەی جونبلات)، لە

[1469] قاموس المصطلحات المدنية والسياسية —د صقر الحيالى واخرين ص102

پاكستان و ئەفغانستان و هند بە پێی تایفی هندۆسی، ئیسلامی بە هەردوو باڵی (سوننە و شیعە)، لە بۆرندا لەنێوان هۆتۆ و تۆتسی، .. هەتا لە نایجیریا وا تێبینی كراوە كە سێ ئایینی سەرەكی لێ بووە لە كۆتاییدا سێ حزبی سەرەكی لێ پەیدا بووە، مەترسی هەیە ئەو دۆخە تایفیانەی جیهانی ئیسلامی تیكەوتوە حزبە ئیسلامیەكان بەرەو تایفی ببات ، بۆنمونە حزبە ئیسلامیەكانی كوردستان بێئەوەی خۆیان وایان ویستبێ حزبەكانیان لە تایفەیەك ومەزهەبیك پیكهاتوە ، ئاینەكانی تری تێدانیە ئینجا مەزهەب وتایفەكانی تریشی تێدا نیە .

لە وولاتی تایفەگەری چەمكی هاوولاتی بوون دووردەكەوێتەوە ،ئەو جۆرە دەولەتانە پێیان ناووترێ دەولەتی هاوولاتی بەلكو پێی دەوترێ دەولەتی پیكهاتە ،كە لەو سەردەمە هەندێوولاتی رۆژهەلاتی ناوەراست وسەرووی ئەفریقا لەودۆخەن .

<u>پێناس:</u> زۆربەی لە چوارچێوەی رەگەزپەرستی پێناسیان كردوە بە زیادەی ئەوەی كە رق و قینە بەرامبەر تایفەی تریش دەردەكەوێ ،هەندیكی لێ هەلدەبژێرین :

+قاموسی ئۆكسفۆرد: كەسی تایفی ئەوەیە كە بەكەلەرەقانە بەدوای تایفەكەیەتی .

+ موسوعة العربية العالمية :الطائفة الدينية مصطلح يعني في المفهوم الغربي فرقة دينية تدين بالولاء لزعيم حي أو تعاليم جديدة أو ممارسة غير عادية.

+ كتابی (قانون الشعوب) هەریەكە لە مەزهەب و تێروانین و بیرۆكەی لێك جیاكردۆتەوە لەهەمان كات پیكیشی بەستۆتەوە ،بەو پێیە بیرۆكە وئایدیا دەكەوێتە سەروو و تایفەش دەكەوێتە خواروو[1470] . ئەوە نزیكە لەو وەسفەی كە بیرۆكە فرقە دروست دەكاو جیابونەوەش تایفە دروست دەكات.

+ بەشیكی تر (كە زیاتر ئەكادیمین)پێیان وایە لەو سەردەمە تایفی ئەو كۆمەلە خەلكەن كە بەدوای زیندووكردنەوەی سەروەری ئاینیكن و بە دوای رێبەریكی نیمچە كاریزمی كەوتون كە ئامانجەكانی روون نیە,یان جار وایە وەك سیۆكراتیەك خۆی دەردەخا .

---

[1470] قانون الشعوب ص229 .

+الموسوعة المصطلحات السياسية نظام سياسي اجتماعي متخلف يرتكز على معاملة الفرد كجزء من فئة دينية تنوب عنه في مواقفه السياسية، وتشكل مع غيرها من الطوائف.

+ معهد السلام الامريكى : ثيَى واية تايفى كةمايةتيةكى ئاينين لة ئاينة طةورةكة جيادةبنةوة[1471] .

**سروشت و سيفاتي تايفي:(هەلس وكەوتەكانی سەرسام)موعتەقەداتی عەجیب**

بە پێی (موسوعە العالمیە) ژمارەی تایفەکان لەجهان 3000 وئەندامیەتی تیایاندا 3ملیۆنە [1472]، واپێدەچی زۆر زیاتر بێت ، لە قورئان ئاماژە بە تایفە دەکا ،موفەسیرەکان دەلێن مەبەست لەتایفە ئەو ژمارەیە لەنێوان 3-9کەسن (لولا نفر من کل طائفة ..)واتە ژمارەی ناگاتە 10 ،تایفی کۆنە بەشێك بوە لە مۆزائیکی کۆمەلگەی کشت وکالی ، بەلام بەخێرایی بەسەلبیانە وەردەچەرخا بۆ ناکۆکی ، ناکۆکیەکانی ئەوروپا لەسەدەکانی ناوەڕاست تا دوای رینیسانسیش تایفی نێوان پرۆستانت وکاتۆلیك وئەرسەدۆکس و..لە نیویەك ئاین بوە ،تەنها مسیحی سەدان جۆرە تایفی بچوك وگەورەی تێدایە ، بۆ ئەو سەردەمە بە جۆریکی تر گوزارش دەکرێت ، تایفە لەسەدەی بیست لەلایەن سەرکردەیەکی کاریزمی زیندوو دەکریتەوە یان لەگەل ڕابوونیکی تر ئەویش زیندوو دەبێتەوە ،لەگەل رابوونی ئیسلامی پرسی سونەوشیعەو سەلەفی وسۆفی وزۆر لای تر زیندووکراوە ،تویژینەوەکانی رۆژئاوایی دەلێن تایفە بەرەو داخستن وجودابوونەوەو دابڕان دەچن کە پێیان دەلێن (کۆمیۆنەکان) ، لای ئەوان خراپ ترین تایفە دەرکەوتوو بێت لە ئەمریکا لەکۆتایی سەدەی بیستەم (جماعە المعبد) بوون کەلەلایەن قەشەی پرۆتستانی (جیمجۆنز) بوو کۆمەلێك چالاکی زۆر نامۆیان دەکرد ،دوای بە پێی رینماییەکی ئاینیانە لە شارەکان کشانەوەو لە شێوەی کۆمیون لە گوندەکان حەوانەوە لە ناوچەی جۆنزتاون لە گایانای خواروی وئەمریکا ،لەسالی 1978 دەستیان بە چالاکی دژی حکومەتی ئەمریکا کردو ئەندامێکی کۆنگریسیان تیرۆر کرد،لە ناکاو بەفەرمانی ئاینی وپەیامی جۆنز

---

[1471] معهد السلام الامريكى (حل النزاعات بين الاديان) –مركز التعليم والتدريب-2008 ص93

[1472] الموسوعة العربية العالمية –مادة:طوائف دينية

900كەسیان هەرهەمویان خۆیان کوشت ،ئیتر لەو دەروازە دەگمەنەوە دەچینە نێو کۆمەلێك هەلس وکەوتی سەسوڕهێنەری دەخەینە ڕوو :

تایفەیەك لەسۆمەریەکان پێیان وابوە ئەو بوونەوەرە گەورە بەیەك خوا دروست نەکراوە، ئانکی زەوی دروست کردوەو ئانۆش ئاسمانی دروست کردوە[1473]، هەروەك تایفەیەکی کۆنی عەجەم شێوەیەك لەوە هاتوە: (بعد النزاع والصلح بين اليزدان (الإله)والأهريمن إتفقا على أن يكون العالم السفلى خالصاً لأهريمن لمدة 7000ألاف السنة)[1474]، ئالێرە بیرۆکەی (خوا لەئاسمانە لە زەوی نیە )دێت ، لە کتێبی ئێزیدیەکان (مەسحەفی ڕەش وجلێوە) ئاوا باسی سەرهەلدانی فرە خوایی دەکا:( ثم خلق ستة آلهة من ذاته ومن نوره وخلقتهم صارت كما إذا أوقد انسان سراجا من سراج آخر :فقال الإله الأول للثاني أنا خلقت السماء فقط اصعد أنت إلأى السماء واخلق شيئا فصعد وصار شمسا وقال للآخر فصعد وصار قمرا والرابع خلق الفلك والخامس صار نجم الصبح والسادس خلق الفراغ يعني الجو تم الكتاب) کوردیەکەی-.. دواتر 6 خواوەندی لە زاتی خۆی دروست کرد یەکەم ئاسمان دوەم ڕۆژ سێیەم مانگ.. چوارەم خولگەی دروستکرد، پینجەم ئەستیرەی بەیانیان، شەشەم ئەتمۆسفیر[1475]، هەندێ تایفە ژیانی دونیاو هاوسەریان لە خۆ حەرام کردوە، لەناو مەسیحیەت و جاروایە لە هەندێ ئاینی تریش هاوسەری نەکردن و پیخواسی و ڕووت وقوتی و نەبونی وەك تەقواو دینداری جدی هەژمارکراوە ،لە کۆنەوە (لە سەدەی دووی زاینی)مەزهەب و تاقمیك هەبوون بەناوی (ئەپۆستۆلیش) ئەوانە بوون کە هاوسەریان لە خۆ قەدەغە کردبوو لەبەر خاتری خودا،هەردەم لە ژیانیکی کولە مەرگی دەژیان ،مالیان دانەدەنا بە فەقییەتی دەژیان ، سوال و دەعوەیان پێکەوە دەکرد ،نزیك بوون لە تەسەوفی ئیسلامی ،بەردەوام بوون تالە سالی 1307 بەیەکجاری لەناوبران[1476] .

---

[1473] بڕوانە: قاموس الخرافات والأساطير ص44-45 .

[1474] الملل والنحل.. ص197.

[1475] کەرمەلی- ه س ل83، ئایەتەکانی32-33)مەسحەفێ ڕەش. بە پیی هەندی سەرچاوە بلاوکردنەوەی کتیبی پیرۆزی ئیزیدیان قەدەغەیە بۆ غەیری ئیزیدی کەچی بلاویش بوویتەوە لەلایەن گەڕیدەیەکی بیانی ووتراوە کە یەکەم جار ئەو کتیبە لە سروتیکی شەوانەیان بە جێما کاتێ هیزیکی لەناکاوی عوسمانی پەلاماری دان .

[1476] المعلم بطرس البستاني –كتاب دائرة المعارف –بيروت سنة الطبع 1816 ، ج1 ص311 .

هەندی تایفە ژمارە(13)ی لا شومە لە هەندیکی تر ژمارە(4) ..، لەلای هەندێکی تر پیکژین وپشمین ئیش دەوەستێنیٚ ،یان دەرکەوتنی بالندەیەك یان پشیلە یان گورگ یان کوندەبەبۆ ..،مانگاپەرستن  وورچ پەرستن لە ژاپۆن لەنیو تایفەی (ئینۆ)...،تایفەیەك لەهندهەیە لە(پاریش) بەچەند برایەك یەك ژن دەهێنن ،لە ئەندۆنیسیا تایفەیەك بەناوی(دانی)لەگەل مردنی کەسیکیان دەبی ئافرەتیکیان سەرەپەنجەیەکی خۆی ببڕیٚ، تایفەیەك بەناوی گۆپیس کونیك لە زمانی ئافرەتانیان دەکەن لەدوای هاوسەریان ، تایفەی هۆریۆد باوەڕیان وایە مادام ئافرەت پرچی دەرکەوت ئەوا کارەسات دروست دەبیت ئەگەر نەیکوژن ، نەریتی هەندی تایفەی تر لە ئەفریقاو مۆریتانیا ئەوەیە ئەگەر کچێك مێرد بکا ئەوە جاریکی تر باوك ودایکی نابینیتەوە لەشەرما هەتا مردنی .

هەلس وکەوت وهەلویست وفتوای زۆر سەیر لەو مەزهەب وتایفانە بەدی دەکریٚ ،ئیبن بەتوتە دەلیٚ لەهند بۆ ئافرەت وخزم وکەسی سەربەرزیە ئەگەر لەگەل مردنی میردەکەی وسوتاندنی ئەویش خۆی لەگەلی بسۆتێنی ،جگە لە پەرستنی مانگا پەرستی و بتپەرستی و رۆژومانگ وسروشت پەرستی ،مادە فیزیاپەرستی ..هەموی یەك ماهیەتە ، ئێزیدیەکان دەلێن خوای هەرەگەورە ئەو دنیایەی ئێمەی بە ملکە تاوس سپاردوە، غەنوسیە (مەسیحیەکان)یش پێیان وایە مادەوپیکهاتە زەمینیەکان پیسن ولەدروستکراوی خوانین بەلٚکو لەدروست کراوی شەیتانە[1477]، ئاینی مهاریش هەربەشێکە لەهندۆسی ولەسەردەمی نزیك بوزا سەری هەلداوەو باوەڕی بەمهاریش هەیە وەك خاوەنی ئەو جیهانە نەك خودا[1478]، هەرچی ئاینی ئیزیدیە(کتێبی جلیوە-بەشی یەکەم ودوەم) نزیکە لەو ئاینەوباوەڕی وایە خوا بە ئیرادەی خۆی ئەو جیهانەی بە(ملکە تاوس)سپاردوە[1479]، بە پێی بڕوای (تایفەی ئیسماعیلیە) ئاسمانەکان ژمارەیان (10)یە، ئاسمانی هەرە سەروو پێغەمبەر (محمد) بەرپرسە لێی، ئاسمانی نۆیەم (ئیمامی علی) ودوای حسن وحسین وعلی زین العابدین، محمد الباقر، جعفر الصادق، اسماعیل بن جعفر الصادق، ئاسمانی هەرە نزیکی زەویش (ح.فاطمة) لێی بەرپرسە ، یاقوت حەمەوی

---

[1477] بۆلدیفیز-الإقتراب من اللە-بحپ فی اصل الکون-ت:منیر شریف ص61

[1478] موسوعة الأدیان مادة:مهاریشی

[1479] ئەنستاس ماری کەرمەلی –کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل63

کۆمەڵێك بۆچون وئیعتقادی تایفی ئیسلامی گواستۆتەوە ،ئەو بۆچوونانەی لە بارەی زەوی وژێر زەوی وهەلکشان وداکشانی دەریاو بوومەلەرزە بە گالتەجاڕی باس کردوە، بەو شێوەیە:

(وفي أخبار قصاص المسلمين أشياء عجيبة تضيق بها صدور العقلاء أنا أحكي بعضها غير معتقد لصحتها. رووا أن الله تعالى خلق الأرض تكفأ كما تكفأ السفينة فبعث الله ملكا حتى دخل تحت الأرض فوضع الصخرة على عاتقه ثم أخرج يديه إحداهما بالمشرق والأخرى بالمغرب ثم قبض على الأرضين السبع فضبطها فاستقرت ولم يكن لقدمه قرار فأهبط الله ثورا من الجنة له أربعون ألف قرن وأربعون ألف قائمة فجعل قرار قدمي الملك على سنامه فلم تصل قدماه إليه بعث الله ياقوتة خضراء من الجنة مسيرها كذا ألف عام فوضعها على سنام الثور فاستقرت عليها قدماه وقرون الثور خارجة من أقطار الأرض مشبكة تحت العرش ومنخر الثور في ثقبين من تلك الصخرة تحت البحر فهو يتنفس كل يوم نفسين فإذا تنفس مد البحر وإذا رده جزر ولم يكن لقوائم الثور قرار فخلق الله تعالى كمكما كغلظ سبع سموات وسبع أرضين فاستقرت عليها قوائم الثور ثم لم يكن للكمكم مستقر فخلق الله تعالى حوتا يقال له بلهوت فوضع الكمكم على وبر ذلك الحوت والوبر الجناح الذي يكون في وسط ظهر السمكة وذلك الحوت على ظهر الريح العقيم وهو مزموم بسلسلة كغلظ السموات والأرضين معقودة بالعرش. قالوا: إن إبليس انتهى إلى ذلك الحوت فقال له إن الله لم يخلق خلقا أعظم منك فلم لا تزلزل الدنيا فهم بشيء من ذلك فسلط الله عليه بقة في عينيه فشغلته. وزعم بعضهم أن الله سلط عليه سمكة كالشطبة فهو مشغول بالنظر إليها ويهابها. قالوا وأنبت الله تعالى من تلك الياقوتة التي على سنام الثور جبل قاف فأحاط بالدنيا فهو من ياقوتة خضراء فيقاد والله أعلم أن خضرة السماء منه ويقال إن بينه وبين السماء قامة رجل وله رأس ووجه ولسان وأنبت الله تعالى من قاف الجبال وجعلها أوتادا للأرض كالعروق للشجر فإذا أراد الله عز وجل أن يزلزل بلدا أوحى الله إلى ذلك الملك أن زلزل ببلد كذا فيحرك عرقا مما تحت ذلك البلد فيتزلزل وإذا أراد أن يخسف ببلد أوحى الله إليه أن أقلب العرق الذي تحته فيقلبه فيخسف البلد. وزعم وهب بن منبه أن الثور والحوت يبتلعان ما ينصب من مياه الأرض فإذا امتلأت أجوافهما قامت القيامة. وقال آخرون: إن الأرض على الماء والماء على الصخرة والصخرة على سنام الثور والثور على كمكم من الرمل متلبد والكمكم على ظهر الحوت

والحوت على الريح العقيم والريح على حجاب من الظلمة والظلمة على الثرى وإلى الثرى ينتهي علم الخلائق ولا يعلم ما وراء ذلك إلا الله قال الله تعالى: (له ما في السموات والأرض وما بينهما وما تحت الثرى طه: 6.)[1480]

زیادلەوەش بڕوا وابوو بروسك لە ئەنجامی ئەوەی فریشتە بەقامچی لە هەور دەدا دروست دەبێ (أَنَّ الْبَرْق مَلَك لَهُ أَرْبَعَة وُجُوه : وَجْه إِنْسَان وَوَجْه ثَوْر وَوَجْه نَسْر وَوَجْه أَسَد فَإِذَا مَصَعَ بِذَنَبِهِ فَذَاكَ الْبَرْق)[1481]،ئەوە ڕێك ئەفسانەیەكی ئەگریكی وئەسكەندنافی هاتوە كە گوایە بروسك لە توڕەیی مانگایەكی زۆر گەورە دێت لە ئاسمان تووڕە دەبێت وقامچی ڕادەوەشێنێتە دوژمنەكانی وبەهەور دەكەوێ ودەبێتە بروسك .

لەگەل زۆر نەریت و هەلس وكەوتی سەیرو سەمەرەی تر ، لەسەر ئەو بنچینەیە هەندێ زاناو فەیلەسوف هەلویستیان بەرامبەر ئاین وەرگرتوە ، تەعمیمیكی هەلە ,تایفیەكەیان گردۆتە نمونەی ئاین وبەو شیوەی خوارەوە :

زۆربەی جار زاناو تویژەران هەندی سیفات ونەریت دەخەنە ئەستۆی ئاین ڕاست نیە ،ئەوە تایفەو مەزهەب وراڕەوێكە لەو ئاینە نەك خودی ئاینەكە ،بەشی زۆری ڕای سەلبی فەیلەسوف وئەكادیمیەكان لەبارەی ئاین لەوە دێت كە لە توێژینەوەكەی كار لەسەر سەپلیكی تایفی دەكا نەك خودی دەقی ئاینی ،لەوەوە وەسفی ئاین بە كارەسات وتلیاك وتخلف و بیئەقلی ..،هەرلەوەشەوە وەرچەرخانی كۆمەلگەی ئەفسانەی (میتۆس) بۆ كۆمەلگەی عەقلانی (لۆگۆس) بە پرۆسەی رزگاربوون بە ئاین دەبەستنەوە ،ئەو كۆمەلە بۆچوونەی خوارەوەش بەرهەمی هەمان بۆچوون :

- تایلر: ئاین لە گیانە عفریتیەكان هاتووە.
- سپنز: لە چیرۆكی مردووەكان هاتووە.

---

[1480]یاقوت حموی- معجم البلدان ج1 ص10 هقروةها ابن كثير-البداية والنهاية ج1 ص32 باسی ئاوای زەوی بە بڕواوە كردوە لەگەل زۆر سەرچاوەی تر.

[1481]ابن كثير-البداية والنهاية ج1 ص53

- كوندريت مولر: له ترسی کارەساتە سروشتی یەکان هاتووه.

- بزر: له مەزنی سروشت هاتووه کۆتایش دێت به کۆنترۆڵ کردنی سروشت.

- فرۆید: له پشیمان بوونەوەی باپیره کوژراوەکەیان هاتووه.

- ج سنتیانا(1863-1952)ئاین لـه شـيعرو پەخشـان وئەفسـانه هـاتوه بەگەشـەی زانسـتی سروشتی هەمو ئەو ئاینانه لەناو دەچیٚ.

- جيسف انتورا: الدين هو عكاز لذوي العقول الضعيفة.

بارون دولباخ لەکتێبی(المسيحيه من غير ستار): ئاين دژ به سیاسەتی راست ودروست وئاسـودەی میلەتانه (ئاین له دروستکراوی تاغوتەکانه)

غارودی: ئامۆژگاری مسیحی دەکاو دەڵێ ئاینداری کات به فیرۆ دانه

-لینین ئاین گولیکی جوانه بەڵام بیٚ بەره

-ماركس: .. ان حرية الاعتـقادالبرجوازية لا تعني بالفعل سوى التساهل بجميع الأنواع الممكنة من حرية المعتـقد الديني وأن يعلن أنه بالعكس يسعى جاهدا إلى تحريـر الضـمائر مـن الأوهـام والخرافـات الدينية[1482].

**ئینتماو تایفه :**

لەچوارچێوەی دابەشیه ستونیەکانی کۆمەڵگه تایفی جیٚ ی خۆی دەکاتەوه، دابەشیه سەرەکیەکان بریتین لەدابەشی (خێلەکی و نەتەوەیی و ئاییىنی میراتی..) جار وایه لەو تەوەرانەش لقی لێدەبێتەوه، لەنێو خێلێك چەند تایفه و عێلێك هەیه، لەناو ئایینه میراتی کلاسیکیەکانیش چەندین مەزهەب و تایەفەی لێدەبێـتەوه، بەپیٚ ی دەروونناسان مرۆڤەکان زیاتر ئارەزویان به وابەسته به بازنەی بچوك تر هەیەبه تایبەتی لەو دۆخانەی که یاسا تەواو سەروەر نەبێت یان یاسا نەتوانیٚ تەواو مافی بۆ زامن

[1482] كارل ماركس- نقد برنامج غوتا ص17 .

بكات،لەو كاتە ئینتمایەكی تری پیویستە بۆ خۆپاراستن وبەرژەوەندی پاراستن،لێرەوە ئینتمایەكی تر چڕ دەكەنەوە لەپاڵ ئینتیمایان بۆ بازنە فراوانەكان، لە بازنە فراوانەكان بۆ ناسنامەی عەولەمی و لە بازنە تەسكەكان بۆ ئینتیمای دەڤەریان، مرۆڤە دەڤەریەكان زیاتر پێویستیان بە ئینتیمای دووەم هەیە لەوەوە تایفی و عەشایەری و بنەماڵەیی ... بەدەمارگیری سەهەڵدەدات، ئەو كاتە ڕق وكینە لە تایفە و مەزهەب و خەڵكی تر دەبێتە بەشێك لە یەكرێزی و پەیداكردنی زیاتر پانتایی هاوبەش نێو تایفە.

هەندێك بەو ڕاڤەیە قایل نین، دەڵێن ئایین لە كۆمەڵە فاكتەرە ستونیەكان نیە، بەڵكو ئاسۆییە واتە تایفی ئایینیش ئاسۆیی دەبێ، بەڵام بەسەرنجێكی كەمێك وورد تر دەردەكەوێ ئایینی ئێستا و تایفە و مەزهەبەكانیش شێوازی میراتی وەرگرتووە، كەمتر ئەوشێوازەی وەرگرتوە كە دەعوە و (تەبشیر) بێت، بەڵكو هەر لەگەڵ لەدایكبوونی بەپێ ی بارودۆخی ئایینی و دایك و باوكی ئایین بۆ منداڵەكەش تۆماردەكرێت لە (ناسنامە) ، ناشیۆنالیزمیەكان بۆچوونیان وایە كە نەتەوەگەری ئینتمایەكی تایبەت ترە لە تایفی ،ئەوەی تایفی ئینتمایەكی ستونیە كەچی ئەوەی نەتەوەگەری ئاسۆییە،زیاتر لەوەش جۆرج ئەنتۆنیۆس لە كتیبەكەی (يقظة العرب)تایفی ونەتەوایەتی بە دژی یەك لەقەلەم داوەو دەلێ سولتان عبدالحمید لەهەولی ئەوەبوە نەتەوەی عەرەب پەرتەوازە بكا لەرێگەی هاندانی تایفی ، بەهەمان ئارستە (د.كیالی- خاوەنی گەورەترین مەوسوعەی سەردەمی خۆی) دەڵێت: (پەیدابوونی نەتەوایەتی سیاسی بۆ ئەوەیە ئەو دابەشیە ستونیەی خێڵەكی و تائیفی و نەژادی و تیرەیی نەهێڵێ)[سحیشتر]، نەخێر، ئەوەش هەر ستونیە، بوونی لە بنەماڵەیەك و خێڵێك و نەتەوە و خاكێك و نەژاد و جنسێك..،ئەوانە میراتین و بەدەرە لە ویست و ئارەزووەكانی خۆی،ئینتمای ئاسۆیی بریتیە لە پەیداكەرەكان(مكتسب) ، وەك بوونی لە ئاینێك و كۆمەڵەیەكی سیاسی و مەدرەسەیەكی فكری ....،بەو شێوەیە نەدەبوایە ئینتمای ئاینی میراتی و ستونی بوایە ، لەبنچینەدا نابێت وابێت بەڵام جاریێ وایە، بۆیە ئایینش بەستونی كراوە، هەرچی تایفی و مەزهەبیە ئەوەیان زیاتر ستونی كراوە، بۆیە هەر دەمارگیریەك بۆی لەشێوەی دەمارگیری خێل و بنەماڵە وناشیۆنالیزمی و باقی وەلائە نەفامیەكانە.

---

[سحیشتر] الموسوعة السیاسة.ع.غ.ف.ق،ج4 ص180.

لەبارودۆخی ئێستا تایفی زیاتر بە دابەشی شیعە و سوننە دەوترێ، هەرچەندە لەنێو زۆربەی ئایینەکان تایفەی جیاجیا هەیە، هەندێك لەپۆلێنەکان مەسیحی و بەسەدان تایفە دابەش دەکەن، بەلاّم کەمترئیستا کێشەیان هەیە، تەنانەت مەسیحی و یەهودی کە دوو ئایینی تەواو جیاوازن لەیەکتر کەچی توانیویانە ئینتمایەکی هاوبەش دروست بکەن ،کتێبە پیرۆزەکانیان یەك بخەن بەناوی (کتاب المقدس- کتێبی پیرۆز) بە جۆرێك تەورات لە (کتاب المقدس) بە (عهد القدیم)تۆمارکراوە، ئینجیلیش بە (عهد الجدید) ،کەچی مەزهەب و تایفەکانی نێو ئیسلام کە یەك ئینتمای ئایینیشیان هەیە تا ئێستا نەیان توانیوە وەها دەستپێشخەریەك بکەن، بۆیە لەکۆنەوە و لەباری ئێستادا بەسەدان تایفە و مەزهەب و کۆمەڵە بەناوی ئیسلام سەریهەڵداوە، بەپێ ی (متوسوعة الفرق و الجماعات و المذاهب الاسلامیة) 417 فرقەی تۆمارکردووە، هەر لەو مەوسوعە باس لەوە دەکا تەنها سوننە و شیعە هەریەکە بۆ (20) تایفەی سەرەکی دابەشبوونە، هەر تایفەیەکیش بۆ بەشی تری نەبڕاوە، ئەوەش بە دابەشی ئینتمای تایفی و مەزهەبی نەوەستاون بەڵکو زۆربەی جار کێشە و خوین ڕشتن ڕوویداوە، هەر لەو ساتەوە بەچەندین ئاڕاستە کێشە و ناکۆکی هەیە، بەتایبەتی لە وڵاتانی عەرەبی، سەرەڕای کێشەی سوننە و شیعە، حوسی و سەلەفی لەیەمەن، ئەبازی و حەنبەلی لە جەزائیر، عەلەوی و مەدخەلی لە سوریا، سوننی و سوننی لە میسر، لە عێراق کارگەیشتۆتە ئەو ڕادەیە لەسەر ناسنامە یەکتر دەکوژن ئینجا بە ئاگر تەرمەکانیشیان دەسوتێنن ، لە کوردستان وعیراقیش هەردوو لا ئینتمایان سونەیە کەچی کورد ئەنفال کرا، ژن و منداڵی بێتاوان ژێر گڵ خران بەزیندوویی، ئەو جۆرەدابەشیە وسەرەنجامەکەی زۆر مەترسیدارە،ئەوەتا عەرەب و ئیسرائیل چەندین جۆرە ڕێکەوتنیان هەیە ،ئەندامیان لە کنیسە هەیە لیستی برایەتی یەهودو عەرەبیان هەیە ،وەزیریان لەدەولەتی ئیسرائیل هەیە، ئەندامی عەرەبی لە حزبی زایۆنی هەیە ..کەچی عربی شیعەو سونە تا ئەو ساتە هیچ ڕێکەوتنێکیان نیە ، زیانە هەرە گەورەکەی ئەو پرسیارەیە لەپێش هەموو جیهانی نوێ قووت دەبێەوە، دەڵێن مادام ئیسلام چارەسەری گشتی و هەموو مرۆڤایەتی لایە بۆ چارەو کێشەی مەزهەب و تایفەکانی ناوەخۆی پێ ناکرێت، بەو شێوەیە دەردی دابەشی تایفی و مەزهەبی دروشمی (الاسلام هو الحل) تێك شکاند ، لەلایەکی تر دەبینین عەلمانی شیعەو عەلمانی سونە ،عەلمانی ئەبازی وعەلمانی حنبەلی ،..کێشەیان نیە کەچی ئیسلامی شیعەو ئیسلامی سونە کیشەیان هەیە ، مانا

ده‌دا كه‌ عه‌لمانی كیشه‌كه‌ی چاره‌سه‌ر كردوه‌ ئیسلامیش پیی چاره‌نه‌بوه‌ ، ئه‌وه‌ش ئه‌و بڕوایه‌ی (شبلی شمیل)ده‌لێت ئیسلام هۆكاری په‌رته‌وازه‌ییه‌ نه‌ك یه‌كخستن ، ده‌شلێ ئاین مایه‌ی په‌رته‌وازه‌و شه‌ڕی تایفیه‌و عه‌لمانیش مایه‌ی یه‌كخستنه‌وه‌یتیان ، ئه‌و تیڕوانینه‌ گورزی گه‌وره‌یه‌ بۆ ئاین.

## سه‌رچاوه‌كانی دروست بوونی تایفی

زۆربه‌ی ئایین و ئایدۆلۆژیاكان له‌دوای خاوه‌نه‌كانیان پارچه‌ پارچه‌ ده‌بێت، مقه‌وه‌ماتی مانه‌وه‌ی ئایین و ئایدۆلۆژیا وه‌ك عه‌شیره‌ت نیه‌، یان به‌ فراوانتر بلێین مقه‌وه‌مات و حوكمی ئه‌و كوتله‌ به‌شه‌ریانه‌ی له‌سه‌ر بنچینه‌ی فاكته‌ره‌ ستونی و میراتیه‌كان دروست بوونه‌ ئینتیمایان سه‌لامه‌ت تره‌ له‌وانه‌ی له‌سه‌ر بنچینه‌ی فاكته‌ره‌ ئاسۆیی و عه‌قلانیه‌ت دروست بوه‌، بۆیه‌ ده‌بینین زۆر به‌ده‌گمه‌ن عه‌شیره‌ت و نه‌ته‌وه‌ ئینشقاق و پارچه‌ پارچه‌ بوونی تێ بكه‌وێ، ته‌نانه‌ت له‌ نێو سیسته‌می عه‌شیره‌تیش له‌و ڕوه‌وه‌ دوو دۆخی تره‌هه‌یه‌ ، ئه‌و عه‌شیره‌تانه‌ی له‌سه‌ر بنچینه‌ی وابه‌سته‌ی خوین هه‌ڕه‌م وپیكهاته‌یان دروست بوه‌ تۆكمه‌ تره‌ له‌و عه‌شیره‌تانه‌ی له‌سه‌ر بنچینه‌ی (زێد) و(دیره‌) دروست بووینه‌ ،هه‌ر له‌وه‌وه‌ ده‌بینین عه‌شیره‌تی عربی تۆكمه‌ تره‌ له‌ عه‌شیره‌تی كوردی چونكه‌ یه‌كه‌م وابه‌سته‌ی خوێن وڕه‌چه‌له‌كه‌ ،دوه‌میان زێدو نیشتمانه‌ ،له‌كۆی گشتی عه‌شیره‌ت له‌ حزب(به‌نمونه‌) سه‌لامه‌ت تره‌ له‌ ترازان ، مه‌گه‌ر به‌ گه‌وره‌بوون و پرۆسه‌ی خه‌ملینی مێژوویی بۆ عه‌شیره‌ت ڕوویدا، كه‌چی ئه‌و تاقم و كۆمه‌ڵه‌ و ده‌ستانه‌ی له‌سه‌ر بنچینه‌ی فكری و عه‌قیده‌ و ئایدۆلۆژیا و یاسایی دروست ده‌بێت زۆر ناسكه‌، خێرا خێرا دوچاری ناكۆكی و یاخی بوون وپارچه‌ پارچه‌ بوون ده‌بێت، هۆكاره‌ بنچینه‌ییه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌ له‌باری یه‌كه‌م فاكته‌ری ستونی (میراتی) چه‌سپاوه‌، ناسنامه‌یه‌ بۆ كۆمه‌ڵگه‌ی كلاسیكی، كه‌چی ئه‌وه‌ی دووه‌م پێویستی به‌ پارێزگاری هه‌یه‌ (لتكن منكم امه‌) واته‌ پرۆسه‌یه‌ هه‌رده‌م ئه‌ركی ده‌وێ، عاده‌ته‌ن له‌دوای خاوه‌ن ئایدۆلۆژیاكه‌ (ڕێبه‌ر) یان ئایینه‌كه‌ (پێغه‌مبه‌ر) ئه‌و بۆشاییه‌ پڕ نابێته‌وه‌ و ناتوانن ته‌نزیر بۆ جووله‌ی بكه‌ن به‌یه‌ك ئاراسته‌، به‌و جۆره‌ دوچاری جیاوازی و لێكجیابوونه‌وه‌ و كێشه‌ی تر ده‌بێت، بۆیه‌ش ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ هاتوه‌ (تفترق أمتي على ثلاث سبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة) به‌پێ ی (مه‌وسوعه‌ الفرق و الجماعات) یه‌كه‌م تایفه‌ له‌ مێژووی ئیسلام (السبأیه‌) سه‌ری هه‌لدا، ئینجا كێشه‌كانی حوكم و فیقه‌ واته‌ له‌ڕووی سیاسی و فیقهی و ڕه‌گه‌زی دابه‌ش بووینه‌،ده‌شگۆترێ پیلانی

یەهودو غەیرە دین لەپشت سەرهەلدانی تایفیەلەکۆنەوە ، لەو سەردەمەش بەتایبەتی پرۆتۆکۆلەکانی زایۆن بۆ ئەو مەبەستە[1484]،بەلام بەشیکی تر پێیان وایە سروشتی موسولمانان و ئەو هەمو دابەشیەیان لە میژوودا پیویستی بە پیلان نیە ، شەڕ لەسەردەمی عوسمان دوای لەسەردەمی علی دوای لەگەل خەواریج دوای لەگەل عائیشە ،شەڕی قەرامیتە ،لەبارەی خلقی قرئان ، لە نیوان حەنبەلی وشافعی لەبەغدا ،تەنانەت حنبلی لێیان نەگەڕا (ابن طبری)لە گۆڕستانی موسولمانان بشاردرێتەوە شەو شاردیانەوە[1485]،دەیان جەنگ وکوشتاری ناوەخۆی تر وای لیکردووین پیداچوونەوە بە (ئیختلاف رەحمەت)بکەینەوە، کێشە هەرە گەورەکە کێشەی سوننی و شیعەیە، شیعە بەوانە دەگوترێ کە لایەنگری ئەوەن لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ئیمامی عەلی  ببوایە خەلیفە و دوای ئەویش ئیمام حوسێن  و ئیمام حەسەن و باقي ئیمامەکانی تر کە لەنەوەی فاتیمەن ژمارەیان 12( الإمام علي المرتضى (ع) (-٢٣ - ٤٠ للهجرة)- الإمام الحسن المجتبى (ع) (٣ - ٥٠ للهجرة)- الإمام الحسين سيد الشهداء (ع) (٤ - ٦١ للهجرة) - الإمام علي زين العابدين (ع) (٣٨ - ٩٥ للهجرة)- الإمام محمد الباقر (ع) (٥٧ - ١١٤ للهجرة)- الإمام جعفر الصادق (ع) (٨٣ - ١٤٨ للهجرة)- الإمام موسى الكاظم (ع) (١٢٨ - ١٨٣ للهجرة) - الإمام علي الرضا (ع) (١٤٨ - ٢٠٣ للهجرة) -الإمام محمد الجواد (ع) (١٩٥ - ٢٢٠ للهجرة) - الإمام علي الهادي النقي (ع) (٢١٢ - ٢٥٤ للهجرة) - الإمام الحسن العسكري (ع) (٢٣٢ - ٢٦٠ للهجرة) - الإمام المهدي المنتظر (ع) (٢٥٥ - اليوم) . ، هەندی جار بە شیعە دەووتریت رافیزە (بیجگە لە زەیدیەکان)،دەلین یەکەم جار (زیدی کوری علی کوری حسین) بەوانەی ووت کە لێی جیابووینەوە[1486] ، پالپشت دەکەنە سەر ( ئال بەیت) لەسەر بنچینەی (ستونی میراتی)  لەوەوە لەلای بەرامبەری قایل نابێ و پێ ی وایە ئەوە جۆرە حوکمەش وەك ئەمەویەکان دەبیتە پشتاوپشت کە لە ئەسلی ئیسلام پەسەند نەکراوە، هەر لە ئەسلیشدا ئایین میراتی نیە وەرگیراوە، ستونی نیە ئاسۆییە، مەرج نیە ئەوەی لە ئالی محمد بێت شیاوە بۆ حوکمداری و دادگەری، میراتگری پێغەمبەر خوێن و ڕەچەڵەك نیە بە بەڵگەی ئەوەی دەڵێ ( العلماء ورثة الانبياء

---

[1484] فلسطين فی رسائل عبدالناصر وکندی ص37

[1485] ابن اثیر- الکامل فی التاریخ ج8ص98 .

[1486] موسوعه الميسره ص1612

)،مەزهەبی سەرەكی بەرامبەر شیعە سونی مەزهەبن، كە پێیان وایە ( ئیمام ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان و عەلی) خەلیفەی راشدیینن، زۆربەی مەزهەبی سوننەش پێیان وایە ناكۆكی نێوان معاویە و ئیمام عەلی دەكەوێتە ئەستۆی معاویەو بە(باغی) وەسف كراوە،ئیمام ئەبو حەنیفە حوكمی ئەمەوی بە (ناشەرعی)وەسف كردوە ، بەڵام هەردوو لا لە كاردانەوەی یەكتر بە وەندە ناكۆكیە نەوەستاون پەرِیتەوە فیقھ و عەقیدە و مێژوو و فەرمودە.. زۆرلای تر، بۆیە لەكێشەیەكی زانستی مێژوویی وەردەچەرخێ بۆ واقیع و سەردەمیش، بۆیە بەشیكی زۆر پێیان وایە كیشەی مەزهەبی نێوان سونەو شیعە سیاسی بوە ئینجا بوویتە مەزهەبی وتایفی،لەوانە موسوعەی بریتانیش وادەلێ یەكەم جار كیشەیەكی سیاسی بووسەبارەت بە رِێبەری سیاسی ، بەهۆی دریژە كیشانی بوە تایفیش[1487]،كاتی خۆی بەهەردوولای ئیمامی علی و معاویە ووتراوە شیعەی علی وشیعەی معاویە ،بەدرەنگەوە(لەسەردەمی عەباسیەكان) وەردەچەرخێ بۆ سونەو شیعە،دەگۆترێ یەكەم جار ئەشاعیرەكانناوی (اهل السنە والجماعە)یان داهێنا [1488] ، لەبارەی دریژە كیشان وگەیشتنی بەرۆژگاری ئیستاش عەلی وەردی دەلێ : لە ئەمریكا بووم كاتی عاشورا بوو ئەمریكیەك لیێ پرسیم ئەو كێشەی نێوان سونە و شیعە چیە هەلبژاردنی نێوان معاویە و عەلیە یان لە نێوان حوسێن و یەزیدە، ووتم ناوەللا ئەوە كێشەی 1400 ساڵ پێش ئێستایە كابراش دایە قاقای پێكەنین!! ، ئەو پێكەنینە سادە نیە گوزارشت لەقەیرانی عەقڵی مسوڵمان دەكات بەتێكرایی، كە چۆن وا دابەش بووینە لەسەر پرسێكی مێژوویی ولە تایفەگەری بەرجەستە بوە .

**بچوكی تایفەو گەورەیی ئاین:** ئەوانەی دابەش بووینە بۆ مەزهەب وتایفە زیاتر دەمارگیریان بۆ مەزهەب و تایفەكەیان هەیە نەوەك بۆ ئەسلی ئاینەكەیان كە هەر لەبنچینەدا دەمارگیری تێدانیە ، موسولمانانیش بەرِوون تر تووشی ئەو دەردە بووینە، زۆربەی مسوڵمانان پابەندن بە مەزهەبی ئیمامێك كە تەمەنی لە 1000 ساڵ كەمتر نیە، جا ئەگەر فتوای هەر ئیمامێك 1000 ساڵ

---

[1487] Encyclopædia Britannica- Article: Sectarianism

[1488] بروانە: د مصطفی الشكعة –اسلام بلامذاهب ص490 2-امام محمدعبدة –رسائل التوحید ص19

بخایەنێ ئەوە جێ ی پەیامی گرتۆتەوە، چونکە عەقڵی مرۆڤ کورت بینە جیاوازیەکەی لەگەڵ پەیام ئەوەیە پەیام هەتا هەتاییە و بۆ هەموو کات و شوێنێکە، کەچی داهێنانی مرۆڤ زیاتر بۆ سەردەمەکەی خۆیتی، بۆیە وا دانراوە کە فتوا بەگوێرەی کات و شوێن دەگۆڕێت، کەچی دەبینین ئەهلی ئایینی وا دەمارگیرن بەرامبەر پرسی فقهی ئامادەن دان بەوە بنێن ناسخ و مەنسوخ لە پەیام هەبێت بەڵام لە فکری ئیمامەکەیان نەبێت، ئامادەن بڵێن ئەو فەرموودە لاوازە کەچی ناچن بەلای لاوازی و هەڵەی ئیمام و مەزهەب و تایفەکەیان.

لەڕاستیدا ئاینەکان یەکتر تەواو دەکەن نەك ناکۆکی، لێرەوە جیاوازی بنچینەیی ئاین ومەزهەب لەوە دێت ئاین پەیامە هەرچی مەزهەبە تیگەیشتنی مرۆڤە لەو پەیامە،بۆیە دەبینین لە نێوان ئاینەکان ناکۆکی نیە کەچی لە نێوان مەزاهیب و تایفەکان ناکۆکی هەیە و دەشبێ هەبێ،کەواتە ئەسلی ئیسلام مەزهەب و تایفەنیە، نە لە دوارِۆژیش بەو مەزهەب و فتوای ئەو ئیمامە لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکرێت، بەڵکو ئەو مەزهەب و تایفانە مەزهەبی ئیسلامیش نین ڕاستی ئەوەیە ئەوە تێگەیشتنی ئیمامەکانە بۆ ئیسلام، ئەوەش کارێکی خراپ نیە هەر ئیمام و موفتیەك ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجی کردووە لەسەردەمی خۆیان وبۆ لایەکی بچوکی ئاین، دەبێ بزانرێ مەزهەب ئاین نیە ،تەنانەت هەمو ئەو مەزهەبانەی هەن ناگەنە5٪ی ئیسلام ،ئاین بریتیە لە تیگەیشتن لە بوونەوەر لە نهێنی نێو گەردیلە تاگەردوون،ئاین ئەوەیە (قل لو كان البحر مدادا لكلمات ربي لنفد البحر قبل ان تنفد كلمات ربي ولو جئنا بمثله مددا)هەرچی مەزهەبە تیگەیشتنیکە بە عەقلیکی زۆر بچووك ،بەهەمو عەقلی بەشەری دلۆپیکە لە دەریای زانست وزانیاری خوایی چ جای عەقلی کەسێك یان چەندکەسانێك،ئەوانەی تایفین زۆرجار رەخنە لە کاری عەقلی دەگرن وتوومەتی (عەقلانیەت ) دەبەشنەوە کەچی خۆیان بەعەقلانیەتی کەسیك وابەستەن ، هەلە گەورەکە ئەوەیە بلێی ئەوە ئیسلامە ، ئیسلام فکرو فلسفەو زانست وشارستانی وتکنۆلۆژی ویاساو دەولەتداری ومنهجی تەعلیم ودادگەری ..،ئەو ئیمامانە تەنها بۆ سەردەمی خۆیان وبەشیکی بچوك داهینانیان کردوە، عادەتەن مەزهەبی وتایفی زیاتر مەزهەبی (ئەحوال شەخسین)، ئەوا سەردەمی ئیستایە هەڵە دەکا کە فەتوا و ڕایەکانی ئەوان فراوان و نەمر دەکەن، ناکۆکیەکی زۆر مەزن لەوانە دەبیندرێ کە دەمارگیری

مەزهەبی و تایفیان هەیە، زۆر داکۆکی لە (دژ عەقلانی) دەکەنەوە دەڵێن عەقڵ بەرامبەر نەقڵ نرخی نیە، کەچی لەلایەکی تر عەقڵی ئەو ئیمامانەیان خستۆتە سەروی نەقلیش بێئەوەی خۆشیان هەستی پێبکەن، لە ئەسڵدا عەقڵ نسبی و گۆڕاوە، نەقل و پەیام چەسپاون، سروشتی عەقڵیش وایە لەگەڵ زەمەن بەپێشتر دەکەوێ، ئەوە یاسایە، عەقڵی ئێستا پێشکەوتوترە و فراوانتر و تیژترە لە دوێنێ، هی ئەوساڵ لەچاو پار، هی ئێستا لەسەردەمی ئەو ئیمامانە، بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر بڵێ ی سەید قوتب و سەعید نەورەسی مستەفا زەلمی و محمد باقر سەدر زانیاریان فراوانترە لە زانیاریەکانی ئیمامەکانی شیعە وسوننە و موعتەزیلەی ئەوسا، ئەو یاسایە پێچەوانەکەی تەنها بێ ئاگایی و دەمارگیریە.

<u>چارە</u>: چارەی کیشەی مەزهەبی وتایفی بەمەزهەب وتایفە ناکرێ ، بۆدۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەو کیشەیە دەبێ لە عەقلی مرۆڤ و فقه بپێچینەوە ،کەچی بۆ چارەسەریەکەی پێویستە لە پەیام(قورئان وسونەی ڕاستەقینە) بگەڕێین ، لەسەر ئەو بنچینەیە لەو ماوەیە کتێبیك بەناوی (قورئان یەکمان دەخاو فقهیش لێکمان جیادەکاتەوە)دەرچوە لەلایەن (شیخ راشدغنوشی) ، کیشەی گەورەی فقه ئەوەیە کەمتر ئامانجی ئاینی دێنێتەدی کە بەرپاکردنی شارستانی وئیعمار وپیشکەوتن وتکنیك وگەشەی عەقلی تێدایە ، زۆر جارمنهجیکی عەبەسیە دیارنیە ئامانجی چیە بۆ دونیا ، وای کردوە ئاینی ئیسلامیش بەرەو لاهوتی وسروش وجۆریك لە مەسیحیەت بڕوا کە وەسفی ئەوە هەلگرێ ئاینی ئیسلامیش ئاینی شەخسی بێت، وای کردسپینۆزا بلێت (ئەرکی فلسفە دۆزینەوەی هەقەو ئەرکی ئاینیش بەندایەتی)[1489]، ئاین مانای تایفەو دووبەرەکی ودابەشی بێت ، بوویتە پاساوی عەلمانی کە بلێت ئاین لە ژیان وسیاسەت ودەولەت جیابکریتەوە ، لەبەر ئەوەی واباو کراوە کە مەزهەب وتایفە یەکسان کراوە بە ئاین بۆیە ئاین ناتوانێ چارەی بکا ، ئەو ئامرازو ئەزمونانەی دەگرێتە بەر بۆ چارەسەر بۆ ئەو سەردەمە ڕەنگە دیموکراسی نزیك ترین ئەزمون بێت ، بۆیە باسیکی ئاین ودیموکراسی دەکەین ئینجا چارەسەریەکان لە ئەزمونی عیراقی نێوان هەردوو تایفەی شیعیو سونەی لێباس دەکەین .

---

[1489] سبينوزا –رسالة في الاهوت والسياسة ص363

**دیموكراسی وئاین :** لەو سەردەمە دیموكراسی بوویتە سیستەمێك هیچ لایەك نەماوە نكولی لیبكات ،بەتایبەتی كە ئیسلامیەكانیش دوای ماوەیەك لە خۆپاریزی ئیستا وا پەیڕەوی دەكەن ،لە راستیدا ئەو ئیسلامیانەی وا دژی دیموكراسین لە بناغەو (مەفاهیمەكانی)نەگەیشتوون ... یەكێ لەوانە, ئەگەر دیموكراسی نەبێ ئەو پەیوەندیەی نێوان ئیسلام و نائیسلام چۆن دامەزرێ, ئەوانەی وا بۆ دیموكراسی دەچن بەمانایەك كۆتایی دێت كە ئەو جۆرە ئیسلامیانە بە هیچ جۆرێك قایل نابن ئەویش ئەوەیە ئەوكاتی دیمكراسی وایە كە لایەنەكانی علمانی لە جیهانی ئیسلامی بە لایەنێكی ئیسلامی حیساب بكرێن ... ئەگینا زۆر ئاساییە لە نێوان علمانی و ئیسلامی پەیوەندیەكی دیموكراسی هەبێ نەك لە نێوان ئیسلامی خۆبەخۆ... بەلام كاتێ فرە لایەنی ئیسلامیش ببێتە بەشێك لە شەرعیەت وئەمری واقیع ئەگەر بە دیموكراسیانە پەیوەندی نێوانیان دانەڕژن بەدیلە واقعیەكەی شەڕو ناتەباییە ، وەك لە ئەفغانستان وجەزائیرو سۆمال بینیمان ، ئەو ئیسلامیانەی پیشو تر كیشەیان لەگەل دیموكراسی هەبوو تا ڕادەیەك پەیوەندی بە ئاستی هۆشیاری هەبوو ،دیموكراسی و (لیبرال دیموكراسی) تیكەل كرابوو زۆر لێكجیانیەكەمیان ڕاڕەوو مەدرەسەو نیمچە ئاینە دوەمیان تەنها ئالیەت ومیكانیزمە ،لەلایەكی تریش واتیگەیشتبوون كە لەهەناوی عەلمانی ورۆژئاوایی هەلقولاوە ،كەچی ئەسلی دیموكراسی لە رۆژهەلات وعەجەم وەرگیراوە بە پێی ئەو مشت ومڕەی نێوان زانایانی فارسی كەلەلایەن (هیرۆدۆتس)ەوە لە522پ ز لە كتێبە مێژووییەكەی وەرگیراوە لەدوای ئەوەی فارس ناوچەكانی ئەوانی داگیر كردوە 7 زانای فارسی سێ جۆر حوكم باس دەكەن و لەكۆتایی دا لەسەر پیشنیاری (ئۆتانۆس شێوەی ئیزۆنومیا)هەلّدەبژێرن بەمانای (یەكسانی لەبەردەم یاسا) كە هاوشیوەی دیموكراسیە[1490]، زیاتر لەوەش واپێدەچێ هەر ئەسلی دیموكراسی ئاینی بێت چونكە ئەمبادیقلس بە باوكی دیموكراسی وەسف دەكرێ، ئەویش قوتابی (ح.داود) بوە، كەواتە لیبرال دیموكراسی زادەی بیری ڕۆژئاوایە بەلّام دیموكراسی مولكی هەمو مرۆڤایەتیە..

---

[1490] T. Asinclair-Ahistory of Greekpolitical thought p36

بەو شێوەیە ئەو زانیاریانەلەلایەك ولەلایەكی تر هەمواركردنێكی زۆر ڕووی لە دەقە فقهیەكان كردوە ،ئیستا دیموكراسی لە خانەی (كوفرو ..)دابەزیە بۆ بەشێك لە خواستی ئیسلامی

## دەولەتی تایفی(عیراق بەنمونە)

دەگۆترێ: ئەوەی مەزهەبیەتی سونەو شیعەی داهێنا (ابن سبأ)بوە ،كە یەهودی بوو دوای بوە موسولمان ..بۆ ئەو باسە بڕواننە (ابن قرناس —احسن القصص لە ص111 هەتا ص134)بەلام زیاتر لە ص123 ئەو كیشەیەی شیعەو سونە هەیە .

زۆربەی وولاتانی جیهان لە دەستور ناوی ئاینی فەرمی تۆماركردوە بەلام زۆر بەدەگمەن وولات هەبێ ناوی مەزهەب وتایفەی تۆمار كردبێ ...، جگە لە وولاتانی ئیسلام نشین وولاتانی مسیحی ئەورووپیش لەدەستورەكانیان ئاینی مەسیحیان تۆماركردوە ،لە مادەی (1 و2)ی دەستوری دانیمارك ،بۆیونان: هەردوو مادەی (1)و(47)، نەرویج: مادە(12)، سوید: مادە(4)، كولومبیا: مادە(54)، كورسیكا: مادە(66)، سلفادور: مادە(12)، اسبانیا: مادە(6)، برتغال: مادە(24)، باركوای: مادە(3)، أرجنتین: مادە(2)،...هەندێ جار بۆ مەلیك زیاتر لە ئاین مەزهەب و تایفەش تۆماركراوە ، لە جیهانی ئیسلامی هاوشێوەی ئەوانە ناوی ئاین هاتوە بەدەگمەن ناوی مەزهەب هاتوە بەلام ناوی تایفە نەهاتوە ، لە دەستوری سعودی (نظام الاساسي) 8 جار ناوی سونە هاتوە بەلام هەمو جاربە ناوی سنە الرسول، ناوی مەزهەبی نەهاتوە ,ناوی مەزهەبی احمدكوڕی حنبل نەهاتوە ، بەلام كە پابەند دەبن بە تایفەیەك لەناو مەزهەبێك تەنگەبەری تووشی مەزهەب وتایفەكانی تردەكا ، لەو ڕوەوە محمدی كوڕی عبدالوهاب دەلێت : (وأما مذهبنا فمذهب الإمام أحمد بن حنبل إمام أهل السنة، ولا ننكر على أهل المذاهب الأربعة إذا لم يخالف نص الكتاب والسنة وإجماع الأمة وقول جمهورها)[1491].

---

[1491] محمد بن عبدالوهاب-الرسائل الشخصية-رسالة رقم:16 ص 107.

هەرچی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران بە ڕاشکاوانە تر یەك جار لەمادەی 12 مەزهەبی جعفری هاتوە ،بەلام ناوی شیعە نەهاتوە ،سەرەڕای ئەوەش وەك سیستەمی سعودیە تەنگەبەری بۆ مەزهەب وتایفەکانی تر دروست دەبێت ، ئەوە دەقی مادەی دوازدەی دەستوری ئێرانە : ( الدين الرسمي لإيران هو الإسلام والمذهب الجعفري الإثني عشري، وهذه المادة تبقى إلى الأبد غير قابلة للتغيير. وأما المذاهب الإسلامية الأخرى والتي تضم المذهب الحنفي والشافعي والمالكي والحنبلي والزيدي فإنها تتمتع باحترام كامل، وأتباع هذه المذاهب أحرار في أداء مراسمهم المذهبية حسب فقههم، ولهذه المذاهب الاعتبار الرسمي في مسائل التعليم والتربية الدينية والأحوال الشخصية (الزواج والطلاق والإرث والوصية) وما يتعلق بها من دعاوى في المحاكم. وفي كل منطقة يتمتع أتباع أحد هذه المذاهب بالأكثرية، فان الأحكام المحلية لتلك المنطقة - في حدود صلاحيات مجالس الشورى المحلية - تكون وفق ذلك المذهب، هذا مع الحفاظ على حقوق أتباع المذاهب الأخرى) .

لەدەستوری لبنانی مادەیەکی وای تێدانیە بەرجەستەی تایفی بێت ئەگەر چی سیستەمی پەیڕەو کردنی تایفیە،ناچاریشە ،چونکە پیکهاتەی ڕاستەقینەی لبنان وایە،بناغەی دامەزراندنی لبنانیش چ لە لائیحەی ئینتداب چ لە ڕێکەوتنەکەی بەشار خوری و ریازسولح هاتوە کەلە 1934 بە (میثاق لبنان)ناوزەد دەکرێت ، بەو هۆیەوە سەربەخۆییەکەی دواکەوت، ئەلیاس هەرپەك بەتەنها چەکی سەربەخۆی لبنانی لە فرنسا هێنایەوە لە رۆژی 1919/8/21 .

بە هەمان شێوە لە دەستورەکانی دەولەتی عیراقی ناوی تایفەو مەزهەب نەهاتوە ،زیاتر برەو بە عروبی دراوە ، دەولەتی عیراق نمونەی پێکەوە نەژیانە لە نێوان دوو تایفەی جیای سونەوشیعە ، ئەوەی زۆر ڕوونە لەو ناکۆکیە وا دەردەکەوێ عەلمانی شیعەو عەلمانی سونە لەو ململانێیە نین، کاتێ عەلمانی غایب دەبێت(لەسەر ئاستی تاك وکۆ) ئەوا ململانێیەکە سەر هەلدەدا ،ئەوەش ئۆتۆماتیکیانە ئەومانایە دەدا کە ئیسلام نەك چارەسەر نیە بۆ جیهانی نوێ بەلکو بۆ ناوەخۆشی چارە نیە ، بۆ کیشە ناوەخۆییەکانیشی دەبێ پەنا بۆ عەلمانی ببات .

ئەوە پارادۆکسێکی گەورەیە ڕووبەڕووی ئیسلام بوویەوە،کە ناشێت،بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ زیاتر دەست نیشان کردنی سروشتی ناکۆکیەکە ، ئەو ڕووداوو ناکۆکیانەی بەدی دەکرێت لە خواروو و ناوەڕاستی عێراق، بەدیمەن وا دەردەکەون کە ئەوە کێشەیەکی مەزهەبی و تایفی بێ، کەچی بە شێکردنەوەیەکی سەرەتایی دەردەکەوێ تەواو دروست نیە ، فاکتەری تری ڕەگەزی وکیشەی ئیقلیمی لەگەلە ،بەلام بەو جۆرە ململانێیە گوزارش دەکرێ ،تا ئەو ڕادەیە دەتوانین بلێین ئەوە کیشەیەکی عەلمانیە بەزانایی خستویانە نێو دوومەزهەبی ئیسلامی وئەوانیش بە نەزانی قەبوولیان کردوە ،ئەگینا لایەنی شیعە هەیە لە پال سونەو پیچەوانەش ئەوەی ناو نراوە (سەحوە ) لایەنگیری دەسەلاتی شیعەیە ، هەریەکە (تیار الخالصی) خودی سەرۆکی لیستی سونەکان شیعەن لەپاڵ سوننەکانن ، لەولایەش خۆ کورد (سوننە)یە بەشێکیان بەسۆزتریشە لەبەشیکی ئەو عەرەبانەی بە ناوی سونە لەو ململانێیەن ، کەچی لەو ململانێیە نیە،هەتا لەسەر ئاستی عەرەبیش شیعەی عیراق لەلایەن میسرو ئەزهەر یارمەتی دەدران دژ بە حکومەتی عیراقی سەردەمی عبدالکریم قاسم ،بەو هۆیەوە ئەزهەر تۆماری کرد کە مەزهەبی جەعفەری یەك لە مەزهەبەکانی ئیسلامە[1492] ،لەگەڵ زۆر بەڵگەی تر، لە سەرووی هەموویانەوە ئەو ناوچەو میللەت و لایەنە سیاسیانەی پێیان دەوترێ (سوننە) بریتین لە میللەتێکی سەربەخۆ وەکو باقی میللەتانی تر لە هەمەجۆر پێکهاتوون، تیایان هەیە ئیسلامی و عەلمانی ومولحیدو باوەڕدارو ..،لای شیعەش بە هەمان شێوە ،لەهەردوولاش توند ڕەوی هەیە ، بەگشتی ڕێسایەك هەیە دەڵێ ئەگەر ململانێیەکی بە ڕاستی شیعەو سونە ببێت ئەوا زیاتر دەکەوێتە ئەستۆی شیعە چونکە سونە باوەڕی بە هەمو ئیمام وڕێبازی شیعە هەیە کەچی شیعە باوەڕی بە ئیمامەکانی سونە وەك پیویست نیە،بۆیە دەبوایە زۆر بەدەگمەن ئەو کێشەیە سەر هەلبدا ،هەرچی ئەو کیشەیەی ئیستای عیراق ناسنامەو فاکتەری تری لەگەل تێکەل بوە ، بەشی هەرەزۆری ناوچەی سونی زیاتر کاریگەرن بە ڕەوتی ناشیۆنالیزمی ، یان وورد تر بەعس و دوای ئەویش تا ڕادەیەك سەلەفی و هەلبەتە ئیسلامی میانڕەویشی لێیە، با بزانین ناسنامەی بەعس چیەو پەیوەندی بە ئاینی ئیسلام چۆنە؟ تا دەرکەوێ ئەو ململانێیە لە نێوان کێ و کێیە؟ بەوەشەوە تۆخمە کاریگەریەکانی ناوچەی سونە دیاری دەکەین :

---

[1492] لاهوت والسياسة ص49 .

1-حزبی بەعس: ناسنامەیەکی نائاینی هەیە هەروەك خۆی لە راپۆرتە سیاسیەکان وئەدەبیات و(دەستوری حزبی بەعس) تۆماری کردووە، صدام حسین لە کتێبی (نظرة فی الدین والتراث)بە توندی جەختدەکا دەلیّ: (المطلوب مناهو ان نکون ضدتسیس الدین)[1493]، لة (دستور حزب البعث العربی الإشتراکی -4-6نیسان 1947) هاتوة:مادة (3) :- حزب البعث العربي الاشتراكي قومي يؤمن بأن القومية حقيقة حية خالدة، وبأن الشعور القومي الواعي الذي يربط الفرد بأمته ربطا" وثيقا" هو شعور مقدس، ... المادة (4) :- حزب (البعث العربي الاشتراكي) اشتراكي يؤمن بأن الاشتراكية ضرورة منبعثة من صميم القومية العربية لانها النظام الامثل الذي يسمح للشعب العربي بتحقيق امكانياته وتفتح عبقريته على اكمل وجه فيضمن للامة نمواً مطرداً في انتاجها المعنوي والمادي وتآخياً وثيقاً بين افرادها. لە ڕاسپاردەکانی کۆنگرەی (4)ی حزبی بەعس 1960 هاتووە: (يعتبر المؤتمر الرجعية الدينية أحدى المخاطر الأساسية أمام التقدم)، لەو سۆنگەوە ڕوانیتیە بزوتنەوەئاینیەکان وحوکمی زۆر قورسی بۆ دەرکردوون ، حزبی بەعس یاسای تایبەتی بۆ حزبە شیعیەکان دەرکردو سزای سیدارە بۆ هەرکەسیك چالاکی سیاسی ئاینی بکا، بریاری (مجلس قيادة الثورة) 1980/3/31 دەقەکەی(استنادا الی احکام الفقرة أ من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ 1980/3/31 مايلی : كانت وقائع التحقيق والمحاكمات قداثبتت بأدلة قاطعة ان حزب الدعوة هو حزب عميل مرتبط بالاجنبی وخائن لتربة الوطن ولاهداف ومصالح الامة العربية ويسعى بكل الوسائل الى تقويض نظام حكم الشعب ومجابهة ثورة 17تموز مجابهة مسلحة ،لذا قرر مجلس قيادة الثورة تطبيق احكام المادة 156من قانون العقوبات بحق المنتسبين الى حزب المذكور مباشرة او العاملين لتحقيق اهدافه العميلة تحت واجهات او مسميات اخرى ،ينفذهذا القرارعلى جرائم المرتكبة قبل صدوره،التي لم يصدرقرار احالتها على المحكمة المختصة –صدام حسين رئيس مجلس قيادة الثورة ) لەگەل زۆر جۆرە بڕیاڕی تر، بەکورتی ناسنامەی بەعس پێکهاتووە لە:

أ/عەقیدەکەی: سۆشیالیستی عروبی.

ب/ جۆری دەسەڵاتەکەی: نازی ئەلمانی.

---

[1493] صدام حسين- نظرة فی الدين والتراث ص14

ج/ پەیکەری ڕێکخستن: لە ڤالانژیسی ئیسپانی.

د/ سیستەمی عەلمانیەکەی: لە سەر ترازی فرنسی بەشی شۆڤێنیەکەی.

د/ سیستەمی سەرۆکایەتی لەسەر شێوەی فاشی ئیتالی..

بەکورتی ناسنامەکەی بریتیە لە پانورامای ڕەگەزپەرستی  و دیکتاتۆرو عەلمانیەکی عروبی نەتەوەیی دەگمەن.. کە دامەزرێنەر و چاوساغەکەی هەریەکە لە میشێل عەفلەق و شبلی عیمسی، جا ئەو حزب و تەیارە چ پەیوەندیەکی بە سوننە هەیە، چ پەیوەندی بە ئایینی ئیسلام هەیە، تا ناکۆکیەکانی لەگەڵ کورد ناوی ئاینی هەڵگرێ (وەك نمونەی ئەنفال) یاخود لەگەڵ شیعە بەناوی سوننە، بەڵام ئەگەر جوان تر پۆلینی بکەین دەبینین بەعس بەشێکە لە تەیاری عەلمانی نەتەوەیی عەرەبی گشتی کە وڵاتانی عەرەبی لەسەر دروست بووە، ئەوەیان یەکێ لە تەیاری هەرە فراوانی ئەو ناوچەیەی ناوی نراوە سوننی کە لەگەڵ دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لە 1921ەوە لە پاداشی یارمەتیدانیان بۆ بەریتانیای داگیرکەر دەسەڵاتیان درا دەست.

2- دووەمین تەیاری کاریگەریش ئێستا لە گۆڕەپانی سوننە کە لە زیادبوندایە بەشێك تەیاری وەهابی سەلەفیە، کە باوەڕی بەوە هەیە خەلافەت و پێشڕەوایەتی ئیسلامی نابێ لەدەست (غەیرە عەرەب) بێت، بەتایبەتی عەجەم، ئیتر ئەو هەشت ساڵە شەڕکردن لەگەڵ ئێران و یارمەتیدانی عێراق لە دژی کورد و ئێران و رابوونی ئیسلامی بەگشتی لەو بنەما قووڵەوە دەهات، تەیاری وەهابی بە گشتی لە عەلمانی نزیکترین نەك لە ئیسلامی چونکە باوەڕیان بە لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی هەیە لە ئاینی ئیسلام، لەسەر ئەو بنچینەیە لەلایەن  (محمد بن عبدالوهاب) و (محمد بن سعود) ساڵی 1737 ڕێکەوتن کە دەسەڵاتی سیاسی بۆ (ال سعود) و فتوای ئاینیش بۆ (وەهابی)، ئەو ڕێکەوتنە لەژێر سایەی بەریتانیا کرادژ بە خەلافەتی عوسمانی و تەکفیریشی کردوون[1494]، تا ئەم ساتەش زۆربەی زانایانی عەرەبی سعودی (سەر بە تەیاری وەهابی سەلەفی- ناجەماعی) پەیڕەوی ئەو ڕێکەوتنە دەکەن، ئیتر ئەوانە زیاتر توندن لەسەر (کێشە فەرعیەکان) و لەدژی گۆڕ و مەزار و موو قرتاندن و...، ڕێکن

---

[1494] بڕوانە (مذکرات هامفر –دکتور الیمانی الفخرانی ص40  هەروەها بڕوانە : فتاوی الائمە النجدیە ج3ص64

لەگەڵ سەرجەم دەسەڵاتدارانی عەرەبی، سەرۆکانی عەرەب و ئەو تەیارەش زۆر توندن بەرامبەر هەر (غەیرە عەرەبێك) بیەوێ بەیداغی ئیسلام هەڵگرێ، کەچی خۆشیان لەکاتی پێویست کەمتر پارێزگاری لە ئاین دەکەن نە لە فەلەستینیش، ئەوانە بریتین لە وولاتانی پاسەوانی (سایکس پیکۆ) ،بە پیی (مذكرات هامفر) ئەوان دروستیان کردوون بەتەواوی فقە وبیروبۆچوونەوە لە ص16 باس لە بناغە ڕێژی ئەسلەکانی وەهابی دەکا کە شەشن .

3- کاریگەری سێهەم لەسەر ئەو کۆمەڵگەیەی ناوەڕاست، تەیاری ئیسلامی میان ڕەو، هەڵبەتە حزبی ئیسلامی وەکو باقی حزبە ئیسلامیەکانی تری عەرەبی بەو پلەیە پشت گیری شۆڤینی عەرەب نەبووینە ، بەشداری هەڵمەتەکانی قڕکردنی کوردوشیعەیان نەکردوە، هەروەك حزبە عەلمانیە عەرەبی و رێکخراوە مەدەنیەکانی عێراقی کردوویانە، بەڵام گلەیی ئەوەیان لێدەکرێ لەچاو بنەمای ئیسلامی بێهەڵوێستی و بێلایەنیان لەو کێشەی نێوان شیعەو بەعس لەلایەکی تر دەولەتی عیراقی و کورد لێ قبووڵ ناکرێ، ڕاستە هاوبەش نین لەو ڕەفتارانەی بەعس، بەڵام تا ئێستاش (مدعی) نین لەسەر بەعس، بەتایبەتی لەو قۆناغە رێکخستنەکانیان لە ڕیشەدا لەگەڵ بەعس زۆر تێکەڵ بووە، ئنجا هەڵوێستیان بە هەمان شێوە لە جەنگی عێراق دژی ئێران، لە پرسی ناوەندێتی خەلافەت... تا ڕادەیەکی زۆرلەژێر کاریگەری عروبی دایە، بۆیە لە ساڵی 1984 ئیخوانی سوریا و بەعس چەند بەیانێکیان بەهاوبەشی دەرکرد.

هەرچی (هيئة العلماء)ە ئەوانەش لە چوارچێوەی هەمان وەسفی سەروون، بەڵام ئەوەیە دەتوانرێ بگوترێ حزبی ئیسلامی و باقی ئیسلامیەکان ڕەگەزپەرست نین بەرامبەر کورد و عەجەم، هەروەك سەرۆك کۆمار (جلال تالەبانی)گۆتەنی ئیسلامیەکان زیاتر سەلمێنەری مافی کوردن نەك عەلمانیەکان، بەڵام ئەو وەسفە بۆ (هيئة العلماء السنە) تەواو پشت ئەستور نیە. سەرنج بدە لەو ڕووداوەی دوای چ هاوارێکی کرد گوایە لە خەمی مزگەوتەکانی سوننەیە! کەچی ئیسلامی کوردیش دەلێت ئەی 4000 مزگەوتی کوردستان بەعس وێرانی کرد بۆ بێدەنگ بوو؟

بەو شێوەیە کۆمەڵگەی ناوەڕاست کە ناوی نراوە (سوننە) پەیوەندییەکی وا فراوانی بە (اهل السنە والجماعە)ی مەزهەبی ئیسلامیەوە نیە، بگرە کۆمەڵگەیەکن لە زۆربەی کۆمەڵگە ئیسلامیەکانی تر

دوورترن لەو (سونە)یە بە حوکمی ئەوەی زیاتر تەیاری عەلمانی عروبی نەتەوەگەری زالە بەسەریاندا، ئیتر ئەوانە زیاتر لە خەمی عەرەبی عێراقی و پارێزگاری لە نەخشەی سایکس-پیکۆ 1916 و بەلفۆر 1917 ن ،لە دروست بوونی عێراقەوە (ئەو سوننەیە) وەك کەمایەتیەك پاوانی دەسەلآتیان کردووەو ئیتر ئێستا کاردانەوەی هەڵچوانەی زۆر ترسناك بەرامبەر بە واقیعی نوێ (کە تیایدا ئەوان کەمایەتی سێیەمن) دەیدەنەوەو چەپ و ڕاست دەوەشێنن، لەوەش زیاتر جاریش وایە زولمیان لێدەکرێ (لەو دەمە بەشداری دەسەلاتی عیراقی وەك پیویست نەکراون )بۆیەدەست بۆ هەموو ئامرازێك دەبەن، ڕەنگە بەپێی سیستەمی میکاڤیلی (بەرژەوەندی) هەقی خۆیان بێ، دەسەلآت و داهات و کەسێتیان وەك سەردەستە بوو جاران ،کەچی کورد و شیعە و کەمایەتی تر و ئیسلامیەکانی عێراقیش لەو دەشت و کێوە ڕاوی لەدوو دەکرا یاخود لە زیندانی و ئەشکەنجەخانە بووە، هەر بۆیەش ناوچەی سوننە لە ڕاپەڕینی 1991 بەشدار نەبوو، ئیتر ئەو کاردانەوە زیاتر لەدەستدانی ئەو ئیمتیازەیە نەك لەدژی ئەمریکا، هەر ئێستا ڕۆژئاوا وەك سەرەتای سەدەی بیستەم ئاسا ڕوویان تێ بکا ئەو ناو و زاراوەی (داگیرکاری) هەڵدەگیرێ و تەقە نامێنێ(بیجگە لە داعش وقاعیدە)، هەر بۆیەش لە سەرەتای داڕووخانی صدام چەندین خۆپیشاندانی جەماوەری لە ناوچە سونیەکان کرا داوایان دەکرد با هێزی کورد و شیعە نەیەتە ناو شارەکانیان با ئەمریکی بێن، بۆ ئەومەبەستەش تەیاری عەلمانی نەتەوەگەری عەرەبی و وەهابیەتی کەنداویان لەگەڵە، کە بریتین لە دەسەلآتدارانی عەرەب، سونەی عیراق هیزیکی بێکەس نین وولاتانی عربی و ئیسرائیل وزۆربەی وولاتانی جیهان لەگەل ئەوانن.

ئەوە بە کورتی ئینتماکانی ناوچەی ناوەڕاستە کە زۆر ڕوونە کۆمەڵگەیەکە لایەنە نەتەوەگەری-عروبی-عەلمانی بەسەردا زالە، ئیتر بۆ لێك جیاکردنەوە ناویان نراوە (سوننە)، هەرچی کۆمەڵگەی خوارووی عێراقیشە، بە مانای شیعی تەواو ڕەنگە دروست نەبێ، ئەوانیش کۆمەڵگەیەکن ئیسلامی و عەلمانی، نەتەوەگەری و چەپی، بێباوەڕ و ڕای جیاجیایان تیایە، ئەوانە بە جیا لە کۆمەلگەی سونی عەرەب زۆر بە بیری عروبی وجامیعەی عربی و(وحدەی عربی) کاریگەر نین ،ئەوەی زیاتر دیمەنی کۆمەڵگەی شیعە پیشان دەدات ئەوەیە لەناو ئەواندا کەمتر زەمینەی عەلمانی و شۆڤێتیەتی نەتەوەگەری لێ شین دەبێ، ئەوەش زیاتر لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی ئێران 1979 و ڕابوونی ئیسلامی جیهانی وا ساغ

بوونەوە، ئەگینا پێشتر مەڵبەندی بزوتنەوەی شیوعیەت و نەتەوەگەری عەلمانی بوو،بۆیە کەم تر ڕوویان لە نەتەوەگەری و عروبیە زیاتر ڕوویان لە مەزهەبە لە تایفیە ، بۆیەش مەیلیان بەلای ئیران وجیهانی شیعەیە ،زۆربەی مەرجەعەکانیشیان عەجەمن:(محمد تقی شیرازی) ،شهرستانی، (محمد کاشف الغگاو) (محسن الحکیم) ، خۆئی ،سیستانی..،تەنانەت سەرکردەکانی شۆڕشی بیست کە زیاتر لەناوچەکانی ئەوان کرا عەرەب نەبووینە ،بۆیە لەلای سونەی عرب وەسفی شیعە بە سەفەوی وئیرانی وهندی دەکرێ ، هەر لە ئەسلیش ئەو ناوچەیە زیاتر ناسنامەیەکی مێژووی عەجەمی هەبوە ، بۆیە شیعەی عیراق ئەوەندە لە خەمی ناسنامەی عروبی عیراقی نین وەك سونە ، هەرچەندە شیعە لە عێراق زۆرایەتین بەڵام لەسەر هەمان ڕێڕەو بەریتانیاش لەکاتی دروستکردنی عێراق بێبەشی کردن، دەقی چەکی دروستکردنی عێراق بەناوی (دولە عربیە فی العراق) هاتبوو، چونکە شیعە بەرگریان کرد بێبەش کران، ئیتر لەوکاتەوە تەواو بە عەرەب پۆلین ناکرێن، لە باشترین دۆخیاندا حسابی عەرەبێکی پلە دوویان بۆ کراوە، بۆیەلەکۆی (8) پالێوراو بۆ عێراق- لەکاتی دروستی کردنی لە1921 هیچیان شیعە نەبوون، لەوانە (مەلیك فەیصەل، مەلیك عبداللە ی برای، برهان الدین کوڕی سوڵتان عبدالحمید، شێخ خزعەل ئەمیری محەمەرە، تالب پاشای بەسرە، عبدالرحمن نقیبی بەغدا، شێخ ئەحمەد سنوسی، ئەمیری پشت کۆە) ئنجا لەدوای دروستبوونی سەرۆکەکانی عێراق (مەلیك فیصل، مەلیك غازی، مەلیك فەیصەلی دووەم، عبدالکریم قاسم، عبدالسلام عارف، عبدالرحمن عارف، احمد حسن البکر، صدام حسین) هیچی شیعە نەبووە،جگە لەوەی هیچیشیان کورد نەبوون، خۆ ئەگەر بەرێژەش بوایە، لەماوەی 80 ساڵ دەبوو بەو پێیە جارێك کورد و دووجار شیعە بوایە، کەواتە جێگەی تێڕامانە. شیعەکان بیبەش کراون بەو مانایەی شیعە ئینتمای بۆ عروبەی عیراق لاوازە ، کیشەکە لیرە سەرهەلدەدا .

سروشتی ناکۆکی شیعە و سوننە

له سایکس پیکۆو دروست بوونی عێراقەوە نەخشەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دروست ببو، کە تیایدا 75٪ عەرەب و 22٪ ی کورد و ئەویتریش کەمایەتی، لەو نەخشەیە سوننەی عەرەب کە رێژەیان لە دەوری 23٪ یان شتێك زیاتر خۆیان شاردبۆوە لەنێو دوو هاوکێشەی ڕەگەزی و تایفی، کاتێ ڕەگەزی بوایە ئەوا وەك عەرەب زۆرایەتی بوون بەرامبەر کورد، کاتێ تایفی و مەزهەبیش بوایە لەگەڵ کورد زۆرایەتی پیشان دەدرا بەرامبەر شیعە. لە هەردوو باریشدا بە سەرۆکایەتی سوننەی عەرەب کۆتایی دەهات، هەریەکە لە جامیعەی عەرەبی و زلهێزانی جیهانیش یارمەتیدەریان بوون، کورد لەو نەخشەیە خنکابوو.

ئەوە بەردەوام بوو لەگەڵ بەردەوام بوونی (ڕابونی نەتەوەیی-عەلمانی عەرەبی)، بەڵام لەدوای هەشتاکان و بەرپابوونی رابوونی ئیسلامی و کشانەوەی رابوونی نەتەوەیی عەلمانی عروبی ئەو نەخشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی عێراق گۆڕا بەزەقی بۆ جۆرە ڕێژەیەکی دیکە، 22٪ کورد، 55٪ شیعە، 3٪ کەمایەتی، 23٪ سوننە[1495]، یان وەك (موسوعە المعرفە)دابەشی کردوون : 55٪شیعە -19٪- سونە- کورد21٪ -ترکمان2٪ ، پۆل بریمەر ڕێژەی سونە لە عیراق بۆ 20٪ دیاری دەکات،دەلیت کوردو شیعە بە هەردووکیان 80٪ پیێك دەهێنن[1496] ، حنا بطاطو لەکتیبەکەی (العراق)ریژەیەکی نزیك لەوە دەلێت پالپشت دەکاتە سەر ئاماری 1947 :

الشيعة العرب 2344000 %51.4
السنة العرب 900000 %19.7
السنة الأكراد 840000 %18.4

---

[1495]ـ لە زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان ئەگەر باسی سونەو کوردکرابێ ئەوە ووتویەتی کورد زیاتر بوە ، بۆ ئەو مەبەستە با بەلگەنامەیەکی بریتانی بەکار بهێنین چونکە لای سونیشیان گرتوە:

*CO 730/ 161/2* سكان كردستان: ينكر الكرد بكونهم اقلية في العراق لأن عدد السنة العرب ليس اكثر من الكرد ولكن اعتبارهم مع الشيعة فقط كعرب يعطي لهم الاكثرية. واذا اجريت احصاء دقيق ولم يحسب الكرد ضمن عرب السنة يكون عدد الكرد والعرب متساويا.فمثلا تم تجاهل عدد الكرد في لواء ديالى ذات الاغلبية الكردية والاقضية الكردية في كوت في الاحصاءات السابقة.

[1496] ثول بريمر —عام قضية فى العراق ص76

الشيعة الإيرانيون 52000 (1.1%)

السنة التركمان 50000 (1.1%)

الشيعة التركمان 42000 (0.9%)

الشيعة الأكراد 30000 (0.6%)

المسيحيون 149000 (3.1%)

اليهود 117000 (2.6%).

اليزيدية والشبك 33000 (0.8%)

الصابئة 7000 (0.2%)

المجموع 4564000 اى اربعة ملاين ونصف[1497] .

سەرچاوەکانی سونەی عەرەب دەڵێن لەعیراق تەشەیوع هەبوە بۆیە سونە کەمی کردوە ،دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئەو بۆچونە ڕاستەو تەشەیوعیکی زۆر سەرسوڕهێنەر هەبوە ،لەسەردەمێك کە دەولەتی عوسمانی دژایەتی شیعەی کردوەو یارمەتی سونەی داوە، لێرە سونەی عەرەب تەشەیوع کراوە کەچی کوردی ئێران هەرلەژێردەستەی وولاتیکی شیعە بووینە ونەتوانراوە تەشەیوع بکرێن ،تەنانەت عوسمانی دانی بە مەزهەبی شیعەو دام ودەزگائاینیەکانی ئەوانی نەکردوە ، ،بەو ئاڕستەیە لە سالی 1862 بە فەرمی والی بەغدا ئەو زانیاریە بە ئەستەمبۆل دەدات کە سونەی عرب وادەتوینەوە بۆ شیعە ،وادیارە تەشەیوعەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعەکان پابەندی ئاینیان بە مەرجەعیەت وماملۆستایانی ئاینی زۆر هەبوە ،ئەوپەیوەندیە لە کۆمەلگەی سونی عەرەب زۆر لاواز بوە ،لە راپۆرتیکی بابی عالی عوسمانی بەناوی سولتان لە 1891/3/24 هۆکاری تەشەیوع دەدەنە پال ئەو هەمو یارمەتیەی بۆ مەرجەعە شیعەکان دێت بەناوی (ئۆدە) کەلە ئێران وهندەوە دەهات ،هەتا سونەکانی عەرەب لە قۆناغی بەدەوی بوون ئەوا هەندێ بەهای بەدەوی هەبوو بۆیان کۆمەلگەکەیانی ڕاگرتبوو ،کەچی کە پیشکەوتنیك لە (بەدەویەوە)بۆ شارستانی ڕوویدەدا دەکەوتنەبۆشاییەکی ئاینی وشیعەگەری ئامادەبوو بۆیان ،لەسەر ئەو بنچینەیە والی بەغدا(**محمد** نامق پاشا) بە نوسراوی فەرمی داوا لە دەولەتی عوسمانی دەکا هەندێ زانای ئاینی بۆناوچە سونیەکان

1497:Hanna Batatu- Princeton University Press, New Jersey, 1978 - P40

بنێرن[1498] ،لەشوێنی تر بۆیان هێنان هەر چارەیەکی وای نەبوو چونکە لە ناوەخۆ ئەو مەلایانەیان نەبوە .

بەهەرحال ئەو نەخشەیەکۆمەلایەتیەی سەروو گۆڕا بۆ ئەو نەخشە نوێیە،تا (صدام)یش مابوو کاریگەری تەواو نەگەیشتبووە ئاسۆ، لەدوای ئەو پرۆسەی دیموکراسی ئەو کەمایەتیەی سوننە دەرکەوت، ئیتر لەو واقیعە نوێیەی عێراق کە هەر لایەنی بەپێی ڕێژەی خۆی.. ئەوا سوننە قایل نین، زۆر بەتوندی لەدژی جیابونەوەی شیعەن لە عروبیەکە، دەیانەوێ وەك جاران شیعە لەگەڵیان بێ هەم بۆ سەرکوتکردنی کورد و هەم بۆ ناسنامەی عێراقی عروبیەکە، ئیتر ئەو دەستوەشاندنەیان لێیان، بەکۆمەڵ کوشتنیان قایل نەبوون بە فیدراڵیان.. هەمووی ئەو کاردانەوەیە، لەراستیدا لایەنی سوننە هەر لەدوای صدام جاڕی جەنگی لەگەڵ شیعە داوە، چونکە شیعە لەجیهانی ئیسلامی وەك تایفی کەمایەتین و ئنجا نەریتە کۆمەلأیەتیەکانیشیان هەندێ رۆمانسی و خرافیاتی تیایە، بۆیە بەدرێژایی مێژوو تا ئەو ساتەش بەشێکی چەوساوە بووینە، مەرجەکانی سوننە و ولأتانی عەرەبی و کەنداو ئەوەیە شیعە بگەڕێنەوە سەر عروبی عەلمانیەکە، وەك جاران یارمەتیدەری سوننە بن لەسەر ئەو بنچینەیە و ناسنامەی عروبی عێراقی بپارێزن، واتە سوننەی عەرەب کێشەی لەگەڵ شیعە نیە لەبەر ئنتمای مەزهەبی، ئەوەتا تەیاری خالصی، لیستی ئەلعراقیە، تاڕادەیەك تەیاری سەدری، چونکە لایەنی عەلمانی عروبیەکەیان زاڵ کردووە بەسەر ئیسلامیەکە ئەوا کێشەیان نیە، وادیارە بە سروشتی خۆی ئیسلامی لەگەڵ عروبی نایەتەوە، بۆیەش لەکۆنەوە هەر عەرەبێك ئەگەر تەواو ئیسلامیش بووبێ، واتە بنەمای (لا فرق بين العربي والأعجمي الا بالتقوى)، (ان افضلكم عند الله اتقاكم)ی پەیڕەو کردبێ، ئەوە لەلای تەیاری عروبی ناوناتۆرەی لێنراوە، زاراوەی شعوبیەت لەوەوە سەری هەڵداوە، سەرنج بدە فەرهەنگەکان هەمووی باسی (شعوبیەت) دەکەن، دەڵێن بەو عەرەبانە وتراوە شعوبی کە عەرەبی بەسەر عەجەم فەزڵ نەکردووە، یان وەك محمد عمارە دەلێ ئەوانەی ویستیان ئیسلام وەرگرن بێ عروبە[1499] ، هەڵبەتە شیعە لەکۆنەوە و

---

[1498] سعد سلوم-السياسات والاثنيات فى العراق(منذ الحكم العثمانى حتى الوقت الراهن) ص62و ص68

[1499] معركة المصطلحات ص213

...

زیاتریش لە عێراق دووچاری ئەو ناوناتۆرانە بوونەوە، وەك شعوبی، هندی، سەفەوی، عەجەمی، ئێرانی، جا نەك شیعە هەر بزوتنەوەیەكی ئیسلامی راستەقینە لەنێو عەرەب ناوناتۆرەی وای بۆ داتاشراوە، بۆیە (ئیخوان مسلمین) گەلێ جار لە ترسی ئەو ناوە و (لومە اللائم) بێهەڵوێستی بووە، نەیتوانیوە بەشداری شۆڕشی كورد بكا، یان هاریكاری بێ،تا ئەو ساتەش لە عێراق (حزبی ئیسلامی- ئیخوان) هێشتا هەڵوێستەكانی بەرامبەر ئیسلامی شیعە لەو ترسەوە سەرچاوە دەگرێ، سەرچاوەی جیاوازیەكانیان ئەوەندە بنەمای ئیسلامی نیە ئەوەندەی بنەمای عەلمانی عروبیە، عەلمانیە شیعەكان كێشەیەكیان لەگەڵ عەلمانی سوننە نیە، بگرە لە هەموان ڕێكترن، كەواتە ئەوەی گرفتە بوونی ئیسلامی شیعەكانە كە بە سروشتی خۆی لە خزمەتی عروبی عێراقی و سایكس-بیكۆ و بەلفۆر نیە، لە خزمەتی گەلەكۆی نیە لەسەر میللەتێكی هەژاری وەك كورد، بەهەمان شێوە زۆربەی وڵاتانی عەرەب پابەند بوون بەشای ئێران تا عەلمانی بوو، كەچی لەدوای 1979 و جاڕدانی ئیسلامی ئنجا ئەو زاراوانەی وەك ئەوە دەوڵەتی شیعەیە، شعوبیە، سەفەویە، ئاریە.. سەردەمی (شا)ی ئێران سەنگەرێكی ئیسرائیل بوو، سەردەمی خومەینی تەواو پێچەوانە.. هەشت ساڵ جەنگ لەگەڵ ئێران گوایە (بوابة الشرقیة للأمة العربیة) بپارێزێ، كەچی كە هێرش كرایە سەر عێراق لە هەموو لایەك هاتنە ناو عێراق (ئوردن، كوەیت، سعودیە...هتد)، تاكە لایەك كە لێی دڵنیابوو (بوابە الشرقیە) بوو، كەواتە ململانێیەكان لەكوێ سەرچاوە دەگرێ؟

پوختەكەی ئەوەیە ململانێی ناوەڕاستی عێراق (سوننە) و خوارووی عێراقیش (شیعە) مەزهەبی نیە، زیاتر خوردبوونەوەی ناكۆكی نێوان عەلمانی عروبی لەگەڵ ئاینیە، بەڵام ئەو سەردێرە بەكاردێت گوایە (ناكۆكی شیعە و سوننە)یە،ئەگەر ناكۆكی سونەو شیعە ڕاستەقینە بێت ئەوە مانای وایە ئاینی ئیسلام ناتوانێ كیشە ناوەكی ومەزهەبیەكانی خۆی چارەسەر بكا چۆن ئیسلام (چارەیە)بۆ كیشەكانی سەرزەوی و خۆرئاواو جیهان ،ئەوە لەكاتێكایە كە علمانی شیعەو عەلمانی سونە براو دۆستن كە دەبنە ئیسلامی ئاوا دەبنە دوژمن ،ئەو پرۆسەیە مانایەكی پڕ مەترسی هەیە ، ڕاستیەكەی وانیە ئەوە عاقلایەتی عەلمانی وتەیاری عروبیە توانیویەتی كیشەو ململانێیەكی خۆی لە گۆڕەپانی ئیسلامیەكان ساغ بكاتەوە

، ئەوە ڕاستی ئەو ناكۆكیەبوو ،بەلام وەك موسوعەی بریتانی وزۆر سەرچاوەی تر كە دەلێن لە بنەچەدا كیشەی سونەو شیعە سیاسیە نەك فقهی لێرەش دووبارە دەبێتەوە ،ڕاستی ئەو كیشەی ئیستا لەسیاسی دەستی پێكرد ،بەلام ئیستا وەرچەرخا بۆ فقهی ومەزهەبی ، هەردوولای توندڕەوی شیعی وسونی كەوتنەوە گیانی یەك ، ئەوە ڕاستی ئەو ناكۆكیەبوو ،سیاسیە نەك فقهی لێرەش دووبارە دەبێتەوە ،واپێدەچی عیراق بەرەو ئەزمونیك بچێت كە چۆن سونی عرب 80سال حوكمی كەمایەتی دیكتاتۆریان كرد ئاواش دەیان سال شیعەش حوكمی دیكتاتۆری زۆرایەتی بكا ،لەهەردوولاش تایفیەت بە ڕوونی بەرجەستە بوە كە عیراق دەولەتی تایفەیە .

ماوە بلێین گەلێ جار هەردوولایان بۆ ئاخافتن لەگەل یەكتر دەلێن ئەوە ئیستعمار ئێمە تیك بەردەدات ،ڕاستە ئەو ناكۆكیانە دەچێتە قازانجی ئیستعمارو عەلمانی وئیسرائیل و زۆرلای تر ،كاریشیان بۆ كردوە وەك لە (مژكرات هامفەر)دەلێت جاریكیان لای وەزارەتی دەرەوەی خۆمان(بریتانیا)باسی ئەوەم كرد كە شیعەو سونە هیچ عەقلیان نیە ئەگینا كیشەی نیوانیان ئەوەندە نیە پێیان چارە نەكریت ..بەتوندی وەلامیان دامەوەو وتیان باسی چارە مەكە باسی تیكبەردانیان بكە[1500] ،ئەوانە شاراوە نیە بەلام ئەوەی دەمانەوێ لێرە بلێین فقهی هەردوو لاو میژوەكانیشیان ئەوەندە لەگەل یەكتر دژدۆنگە پیویستی بە پیلانی ئیستعمار نیە .

ئەسلی عیراقی سیاسی تایفی و رەگەزیە

دەولەتی عوسمانی بەفەرمی دانی بە مەزهەبی شیعە نەنابوو ،ئەوە لەلایەك ئیجابیە ئەگەر بلێ هەموی موسولمانن پیویست بەو جیاكاریە ناكات ، بەلام لەلایەكی تر كۆتای بۆ مەزهەبە ئیسلامیەكانی تر دیاری كردبوو ،شافعی وحەنەفی هەریەكە كورسیەكیان هەبوو لە ئیدارەی ویلایەتی بەغدا ،لەسەردەمی سولتان عبدالحمید زیاتر لەپیشوو ریزی بنەمالەی شیخ وسەیدو كەسایەتی ئاینی گیرا ، بە فەرمانیكی سولتان لە 1879 بنەمالەی عبدالرحمن نقیب لە تەجنیدی ئیجباری بەخشران ونەقیبیش كرایە ئەندامی هەمیشەیی

[1500] ملحق مذكرات هامفر –دكتور اليماني الفخراني ص23 .

ئەنجومەنی ولایەتی بەغدا (دوایش گەورەترین خیانەتیان لەگەل عوسمانی کردو دەستیان لەگەل هیزی بەریتانی تیکەل کرد) .

دوای ئەوەی (ئەنوەر پاشا) بڕیاری دا لە 1914/10/29 بچێتە ناو جەنگ لە قازانجی وولاٌتانی تەوەرە بێ ئەوەی پرس بە سولّتان بکات، یەکەم کاردانەوە بەریتانیا لە ویلایەتی بەسرە هێرشی هێنایە سەر عوسمانی و هێزەکانی لە بەحرەین ڕا بەرەو کەنداو جولاند، لە ڕۆژی 1914/11/7 شێخ الاسلام خەیری فەندی و30زانای گەورە لەگەل محمدرەشاد فتوای جیهادی دا، لە هەر سێ ویلایەتی موسڵ و بەغدا و بەسرە وە لاٌمی ئیجابی لەو شوێنانە درایەوە کە مەدرەسەی ئاینی لێ هەبوو، لەسەر ئەو بنچینەیە لە ناوچە بەدەویەکانی (سونەنشین) زۆر بە کەمی بە پیل ئەو بانگەوازەی شێخ الاسلام هاتن، بەلاٌم لە کوردستان و لە ناوچەکانی سامرا و کازمیە و نەجەف و کەربەلا... زۆر بە گەرمی هاتن، هێزێکی مەزن بە سەرۆکایەتی شێخ محمود چووە خواروو شان بەشانی هێزەکانی زانایانی نەجەف وکەربەلا، لەوێ ڕووبەڕووی هێزەکانی بەریتانیا بونەوەو خەریك بون شکستی پێ بهێنن جنرال تاوزندیان بەدیل گرت، ئەو هۆسەیەی عەرەب لەو سەرکەوتنانە هات بەسەر شێخ (ثلثی الجنة لهادینا وثلث للشیخ احمد واکرادة)، ئەگەر خیانەتی عەشایرە عەرەب و ئەفسەرە عەرەبەکانی وەك نوری سعید و مولود مخلص و علی جودت ئەیوبی وتالب پاشا (میری بەسرە) و شێخ خزعل (میری محەمەرە) نەبوایە ئەوا خەریك بوو بەریتانیا دەربکەن لە (دارالاسلام ـ وای پێ دەووترا)، ئەو خیانەتانە وای کرد (سلیمان عسکری پاشا)ی سەرکردەی عوسمانی خۆی بکوژێ، ئینجا ئەو هاوپەیمانیەی شیعە و کورد و عوسمانی هەلّوەشایەوەو هێزەکانی کوردیش گەڕایەوە، بەریتانیا توانی بە ئاسانی (ئەوەی ئیستا پێی دەووترێ عیراق)داگیر بکات و نەخشەی دروست کردنی دەولەتی لێ جێبە جێ بکا ، میژووی غیراقی سیاسی لێرە دەست پێدەکات.

لەسەرەتای دروست بوونی عیراق ناسنامەیەکی تایفی وڕەگەزی بە ،هەر لەکۆنگرەی قاهیرە 12 ـ 1921/3/24 کە عیراقی پی دروست کرا، یەکێك لە پاساوەکانی بەرەی دژ بەکورد مس بیل، برسی کۆکس، ویلسون، بەرامبەر گەلالەکەی چەرچل ئەوەبوو کە ئەگەر کوردستانی خواروو نەخرێتە سەر عیراقی تازە ئەوا ناهاوسەنگیەکی فراوان لەنێوان سوننەو شیعە دروست دەبی، پێداگری لەسەر

ئەوە کرا کورد بخرێتە سەر عیراق تاسونی کەمایەتی نەبن بەرامبەر شیعە، بەتایبەتی تازە شۆرشی (20)کپ کرابۆوە، کە لە لایەن زانایانی شیعەوە سەرپەرشتی کرابوو، ،زانایانی ئایینی لەدژی دروست بوونی عیراق بەو جۆرە وەستان بۆیە مس بیل زانایانی ئایینی عێراق بە هەرە دوژمن پۆلین دەکا[1501]،بەتایبەتی شیعە بۆیە مس بیل دەڵێ من سونیم[1502]، زانایانی ئایینیش دەوڵەتی عێراق بە مورتەد و خیانەت لەقەڵەم داوە[1503].

لەو کاتیەوە تا ئەو ساتە عیراق هەر لەسەر تایفی ورەگەزی رۆیشتوە ،یەك هەلویست نەبووینە ، ،هەرسێ پیکهاتە هەلویستیان لەیەك جیابوە، زۆربەی جار پیچەوانەش بووینە،بۆیە ناکرێ بلێی (گەلی عیراق) ،کە بریتانیا لە 1914 هاتە فاو وشوعەیبە شیعەو کورد شەریان کرد سونە کەوتنە ژێر رێنمایی شەریفی مەکەو هاریکاری بریتانی کرد، بە هەمان نەخشە لە شۆرشی 1919 و

[1501]ـ العراق في رسائل مس بيل ص39

[1502]ـ کوتلوف لەکتێبی(الثورة العراقية ص213) لە بارەی هەلوێستی ناوچە سونیەکان دەلێ:وفي بغداد إنطلقت مظاهرة وطنية في 1920/8/6 مؤيده للإنجليز ومعادية للثورة، أما مناطق الموصل وغربي بغداد- حيث يتركز نشاط القوميين فيها ـ فقد منعت من انتشار الثورة .

[1503]ـ الثورة العراقية الكبرى ص36... بۆ زیاتر زانیاریت لەبارەی دژایەتی ئاینیەکان بۆ دروست بوونی دەولەتی عیراقی ولاگیری عەلمانیەکان بۆ دروست بوونی، ئەوەی خوارەوە لەتوێژینەوەی خۆمان بەناوی (الإسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثة)بخوێنەوە: اما من جهة الحركة الوطنية والعلمانية، فقد وقفت أكثريتها ضد ثورة عشرين وأيد البريطانيا، وقد عرض(نورى السعيد) خدماته للإنكليز ضد الثورة واوفدوا (ثابت عبد النور) نيابة عن جمعية العهد للأتصال بوزارة الخارجية البريطانية عارضاً عليها: ((ان جمعية العهد يمكن ان تقدم مساعدة قيمة للأنكليز فى تهدئة الأوضاع ما بين النهرين)) ، وقد عرض كل من الملك فيصل وجعفرالعسكرى أفكارهما عن طريق (مس بيل) لتأسيس حكومة وطنية مع الإعتراف بالأنتداب البريطانى ومقترحات أخرى معادية للثورة ، وقد وقف كل من طالب باشا وعبد الرحمن النقيب بلا تردد مع بريطانيا حيث أخذ (طالب باشا) على عاتقه مسؤولية تفريق الإجتماعات المعارضة لبريطانيا، بينما وصف (عبدالرحمن النقيب) الثوار -اوأى من يعارض بريطانيا- بأنهم مجانين و(لاشرف لهم)، و وصف الثوار بالشيعة والتقية والوثنية، وهكذا كانت هناك حملةأعلامية متبادلة بين أدباء الثورة والأدباء الموالين للإنكليز، والذين شكلت منهم الحكومة العراقية فيما بعد، فقد وصف الموالون لبريطانيا من قبل إعلام الثورة: بالمرتزقة و الحوشية وابورغال وحفيز وشبانة الخونةوالمرتدين..الخ، وقد منعوا دفن موتاهم على الطريقةالأسلامية، وكذلك وصف الشريف واولاده الملك فيصل وعبدالله...) بالمارقين، ووصف الشيخ (محمد رضا الشبيبى) الدولة الحديثة التى قامت فى العراق بعد الثورة بانها: ((مستقلة ذات سيادة فى الظاهر، ولكنها لم تكن كذلك فى الواقع فالإستقلال كان إستقلالاً ملوثاً، واتضح لهذا الشعب الكريم ان هناك خطة استعمارية مرسومة اعتبرت الثورة العراقية الكبرى بموجبها جريمة)) .

1920 دووباره بوویەوە ،لە پرۆژەی یەکگرتنی عیراق لەگەل سوریا ئینجا میسر سونە ڕازی بوو کورد وشیعە ناڕازی بوون ..تا دەگاتە شەڕی ئێران سونە لای سەدام بوو ،شیعە لای تەهران بوو کورد دژی بەغدا بوون ،لەڕاپەڕینی 1991 شیعەو کورد ڕاپەرین سونە لای بەغدای گرت ،هەردوو لا پیویستیان بە هێلی ئەمانی (36 و34)بوو کەچی سونە پیویستی پیێ نەبوو ،تا ئەو ساتەش لەهاتنی ئەمریکا لە ڕووداوەکانی ناوچەکە یەك هەلوێست نین ،ئەوجارە سونە دژە شیعە وکورد خۆشحالن ..،هەروا ئەو وەسفەی ملك فیسەل کردوونی و ووتیەتی:(في اعتقادي لا يوجد في العراق شعب عراقي بعد، بل توجد تكتلات بشرية خالية من اي شعور وطني)[1504]ڕاستەو عیراق نابێتە دەولەتی هاولاتی بەلکو دەولەتیکی پیکهاتەیە.

هەلویستیان بەرامبەر کورد:

لەسەروو دەرکەوت لایەنە سونیەکان زیاتر کاریگەر بوون بە تەیاری عروبی و بنەماکانی سایکس پیکۆ بۆیە ئاساییە بەشێك بن لە مەینەتی کورد ، یارمەتیدەری دەسەلاّتی عێراقی بوون لەدژی داخوازیە سروشتیەکانی کوردستانی،ئەو کاتەی کە عەلمانی وتەیاری عروبی بەسەر شیعەکان زال بوو ئەوانیش هەلویستیان خراپ بوو ، ئەو بەشە ئیسلامیەی کە قەتیس مابۆوە لە (مەرجەعیەت) بەگشتی هەلۆێستیان بەرامبەر کورد باش بوو، هەولّی (محمد تقی شیرازی) لە بیستەکان، دوایی (محمد کاشف الغطاء) لە سیەکان، لە هەموان نمونەیی تر هەلۆێستی (محسن الحکیم) بۆیەش سەرکردە کوردەکان زیاتر هاوپەیمانیان لەگەلّ ئەوان هەبوە وەك:هاوپەیمانی شیخ محمودو ئایەتوالله شیرازی سەرۆکی شۆرشی بیست،دوای هاوپەیمانی بکرصدقی کورد وئایەتوالله کاشف غیتا،دوای مەلا مستەفا لەگەلّ محسن الحکیم، تادەگاتە هاوپەیمانی ئیستای بارزانی وتالەبانی لە گەل حزب وسەرکردە شیعەکان،ئەوانە بەلّگەنامەن، زیاتر لەوەش محسن الحکیم لەدوای هەلمەتە ئەنفالیەکانی عبدالسلام عارف بۆ سەر کوردستان لە 1963-1964 کۆنگرەیەکی ئیسلامی رێکخست لە بەغدا زانایەکی زۆر ئامادە بوون لەوانە (شیخی ئەزهەر) بۆ ئەوەی بە فتوا کورد بە یاخی (مارق) هەژمار بکەن بە پێی ئایەتی:(إِنَّمَا

---

[1504] حنابطاطو- العراق ج1ص44.

جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)،لەوەوە لە 5ی تەموزی 1965 فتوا بە ناوبانگەکەی محسن الحکیم دەرچوو دژ بەو کۆنگرەو دژ بە شەڕی کورد،هەروەها (علی سیستانی)مەرجەعی شیعەی ئیستایان دووبارە لە بارەی کوردفتوای فیدرالی هەیە[1505]،یەکەم وەسیقەی(فتوایی) ئاینیە سەبارەت بە دۆزی کورد،بۆ عێراق لەدەستور بە هێز ترە.

. بەو شێوەیە (مرجعیەت و لایەنە ئیسلامیەکانی خواروو) لە چوارچێوەی دووربوون لە کاریگەری عروبی هەڵوێستیان پۆزەتیڤ بووە، لە ئەنفالی 1987.. دیسان حکومەتی بەعس نەیتوانی فتوا لە (مەرجەعیەتی نەجەف) وەرگرێ، نەیتوانی لە هیچ بزوتنەوەیەکی ئیسلامی سونەش وەرگرێ (ئەوەی فتوای داوە وەك تاك داویەتی) ، ئەوەش بەڕونی دەریدەخا کە دروستکردنی دەوڵەتی عیراق لەو پێکهاتانە هەڵەیەکی گەورە بوە، کەواتە نەك دەوڵەتی عیراقی یاخود حکومەت و دەستور، بەڵکو خودی عیراق هەڵەیە، مەینەتی کورد و پیناسی بزوتنەوەی کوردایەتیش لەو هەڵەیە سەرچاوە دەگرێ

کەواتە وردەکاریەکی زانستی و سیاسی زۆر بەستاندەری دەوێ بۆ چارەکردنی ئەو هەڵەیە، بۆیە هەر تەباییەکی هەردوو پێکهاتە لەسەر بنچینەی (عروبی ـ إثم) دەبێتە گورز بۆ ئاسایشی کورد، یان بەکورتی بێ چارەسەری دادگەریانە دوزی کورد هەر تەباییەك لەنێوان پێکهاتەکانی عیراقی مەرگی کوردە، پێچەوانەش بە پێچەوانەیە،هەر تەباییەکی کوردو شیعە دەبێتە کارەسات بۆ سونە ، ئەوەش ڕێڕەوێکی دەگمەنی (مارکیز دارجنستون)ە کەدەلێ:(بەیەك گەیشتنی دووبەرژەوەندی لەدژی سێیەم)[1506] ئەوەش زۆر وێران کەر دەبێت وزەمینەیەکی بەئاژاوەو بێ متمانە دروست دەبێ، ئەو فاکتەرانەی پێکهاتەی شیعە و سوننە یەك دەخاتەوە بریتییە لە چەمکی عروبی نیشتیمانی، یاخود

---

[1505] دەقی فتواکەی (24ذی الحجة11424)سەبارەت بە فیدرالی کە لە وەسیقە رقم53 دەرچوە ،ئەوە دەقەکەیەتی: ((ان اصل الفدرالیه ونوعهاالمناسب للعراق،.. ومن المؤکد ان ممثلی الشعب الکوردیـالعزیزفی مجلس کتابة الدستور سیتوصلون مع سائر اخوانهمالعراقین الی صیغةمثلیتحفظ وحدةالعراق کما تحفظ الحقوق جمیع اعراقة وقومیاته))ـالنصوص الصادرة عن السید السیستانی فی المسألة العراقیة ص280

[1506] - جان جاك رۆسۆ-فی العقد الإجتماعی ص68

عەلمانی عروبی کە سورشتێکی شۆفینی هەیە، بە پێچەوانەوەش هەر خودی فاکتەری ئاینی لەگەڵ هەڵەی عیراق یەکناگرێتەوە[1507] ،ئەدی بۆچی عاقلمەندی کورد بە تایبەتی ئاینیەکانیان نەیانتوانیوە ستراتیژی رزگاری و ئەو ڕاستیە پێکوە ببەستنەوە ؟ گرفتەکە لەوەیە مونەزیری ئیسلامی بۆ (فقهی رزگاری) لاوازە بە تایبەتی زاناو مونەزیری کورد..ئەگینا ڕەنگە پێچەوانە بێت ، فقهی رزگاری کوردستان نابێ بۆ فقهی مەزهەبەکان بگەڕێتەوە چونکە ئەو کاتی کێشەی نەتەوەیی نەبوە،ئینجائەو فقهە کەم وکوڕی هەیە لە (نەسەب) بۆ غەیرە عرب،زانای ئاینی کوردو مونەزیری سیاسی دەتوانێ ڕاستەوخۆفقهی رزگاری کورد لە سەرچاوەی ئەسلی وەرگرێ، هەرچی لە بارەی سیاسیشەلەو سەردەمە بەڵگەنامەی زانایانی ئایینی وبزوتنەوە ئیسلامیەکان زۆر کەمە کە بتوانی شانازی پێ بکەی، ئەوەی هەشە وەك بەڵگەنامە زیاتر بۆ زانایانی شیعە دەگەڕێتەوە.

لەباری ئیستادا غیراقی تایفیانە لەوە بەرجەستە دەبێت کە هەرسێ پیکهاتەی عیراقی وتورکمان ومەسیحیش هەریەکە خۆی پێ مەزلومە ، بە ڕوونی دەردەکەوێ دروست کردنی عیراق و دابەشی کوردستان چۆن گورز بووە لە کوردستان ئاواش لە شیعە، لە سونەی ڕاستەقینەش بەفراوان تر لەتەواوی میلەتانی ناوچەکە ،سەرەرای ئەوەش مانای ئەوە نیە هەمو شیعەیەك باش بووبیت و هەمو سونیەکیش خراپ بووبیت،یان کوردی خراپ لە (سونەی چاك وشیعەی چاك)باش تر بێت ،ئینجا پیویستە ئەوەش دووبارە ڕوون بکریتەوە کە مەبەست لەعەرەبی سوننەی عەقیدە نیە بەڵکو سوننەی کۆمەڵایەتیە، ئەگینا ئەو گوزرانەی لە کوردستان دراوە لەسەر دەستی ئەو پیکهاتەیە لە لایەن ئیسلامی سوننە نەبووە، بەڵکو حزبی عەلمانی و ناشیونالیزمی بووینە.نمونەی حزبی بەعس، بەڵام بەشێ لە توێژەرەوان پێیان وایە سەرەڕای ئەو هەلوێستە ترسناکەی حزبی بەعس بەرامبەر ئاین هەر سونیەکان(وەك زۆرایەتی لایەنگیری بووینە)، بەگشتی ئەو بەراوردانەی خوارەوە هەیە لە نێوان هەردوو تایفەی شیعە و سوننە سەبارەت بەکێشەی کورد:

---

[1507] بۆ ئەو مەبەستەو زیاترزانیاری لەبارەی بەرپرسیاریەتی عەلمانی لەمەینەتی کورد بڕوانە:(ڕۆلی عەلمانیەت لەدروست بوونی مەینەتی کورد).

1. هەمو ئەو پرۆسانەی دژ بە کورد کراو ن لەسەرەتای دابەشی کوردستان و لکاندنی بە عیراق و لەسەردەمی یەکەم راپەرینی شیخ محمود هەتا ئەنفال و کیمیایی ئەوا ئەو گوزرانە لەلای سوننەی عەرەب هاتووە نەك شیعە.

2. سوننەی عەرەب لە عیراق زیاتر نوێنەرایەتی سەرخانی سایکس پیکۆو بۆ چوونی جامیعەی عربی و ڕەهەندی عەرەبی لە عیراق دەکا، کە تەیارێکی شۆڤینی و رەگەز پەرستە بەرامبەر کورد، کەچی شیعە کەمتر ئەو دریژکراوەی هەیە،

3. لەدەوری سالانی بیست لەگەل (ا. محمد شیرازی) دوای ئەو لەسالانی 1930 لەگەل (ا. محمد کاشف الغطاء)، دوای لەچلەکان لەگەل (ا. محسن الحکیم)، دوای ئەوانە لەگەل محمد باقر الصدر و نەوەی ئال الحەکیم، دوای ئەوانەش کە 2003 بەدواوە بۆ یەکەم جار (ا. علی سیستانی) بەفتوایەك لاری نەبونی لە فیدرالی دەربری، ئەو جۆرە پەیوەندیە کەمتر بووە لەگەل زانایانی ئاینی سوننە، ئەوەش بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەلبیات وهەلس وکەوتی هەراجخانەی عەلمانی کورد، کە گەلێ جار خۆی وکورد تاوان باردەکا بێ ئەوەی کارەکەشی ئەنجام دابێ یان لێی سودمەند بووبێ، بەشە گرنگەکەشی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆلای زانایانی سونەی عەرەب، هەرچەندە ئەوزانایانە بەشدار نینە لەو مەینەتیەی بەسەر کورد هاتووە، بەڵکو هەلوێستیان بەراورد ناکرێ لەگەل لایەنە عەلمانی و ناشیونالیزمیە سونیەکانی عەرەب، بەڵام گلەییەکە لەچاو ئیدیعای ئیسلامیان خەست دەبێتەوە، بەکورتی هاوکێشەیەك هەیە هەمو لایەکی پێ لە قەپان دەدرێ، ئەویش ئەوەیە هەتا فکری عروبی نەفامی زال تر بێت بەسەر هەر لایەن و پیکهاتەیەك ئەواهەلویستی بەرامبەرکوردخراپترەپیچەوانەشی بە پیچەوانەوە.

4. هیشتا ئەزمونەکە تەواو نەبوە بتوانین حوکمی کۆتایی بدەین ئاخۆ بۆ کورد بەو ئەندازەیە ڕاستە سونە دژی کوردەو شیعەش دۆست ، ئەوە لە80سالی حوکمی سونە ڕاست دەرچوو ،ماوە ئەزمونی حوکمی شیعە ببینین لەدوای 2005 بزانین ئاخۆ هەلویستیان لەکاتی بیدەسەلاتی وبەدەسەلاتی وەك یەکە ،هەندێ ئاماژە دەری دەخا کە ئەوانیش (یانووردتر ئەوەی ئیستایان دەسەلاتدارە) چاوی لەزولم کردنە چاوی لەچارەسەری کێشە تایفی وڕەگەزی نیە .

ئیستا : دوای ئەوەی سونە زولمیکی زۆری لە کوردو شیعە کرد ئالەو دەمە ئەو جارە شیعە وازولم لە سونە دەکا ، دەردەکەویٚ هەرلایەك دەسەلاتی هەبیٚ بە نیازی تەبایی نین ،بە گۆتە بانگیشەیی برایەتی دەکەن ولەژێر ئەو دروشمە یەکتر قڕ دەکەن ،ئەو دۆخە تا ڕادەیەك کوردیش دەگریتەوە سەرەڕای ئەوەی لیبوردن وتەبایی هەیە بەلام ئەو ماوە حوکمەی لە موسل وناوچەکانی عەرەبی وەك پیویست نەبو، دەسەلاتی کوردیش لەو تاقیکردنەوە سەربەرزانە دەرنەچوو ،زۆر جار زولمی کردوە ،کەواتە هەرسیٚ لا بە هۆی زولم کردن ویەکتر بچوك کردنەوەو بێهیز کردن بە زەمانەتی مانەوەی خۆی هەژمار دەکا .لەسەر ئەو بنچینەیە هیچ لایەك متمانەی بە هیچ لایەك نیەو ئاسایشی نەتەوەیی هەرسیٚ پیکهاتە جیایە لە یەکتر،یەك (گەل)نین،یەك هەلویستیش نین ونەبووینە،لەسەر ئەو بنچینە هەرلایەك دەسەلات بگرتە دەست زۆر بەتوندی لەوانی تر دەدات ،لە جیاتی برایەتی بنەمای مرۆڤایەتی و ئاینی (مثل المؤمنین ...)، ریسای (مصائب القوم عندالقوم فوائد..) .

بۆیە بۆ چارەی کیشەی عیراقی پیویستە دان بەوە بنێین کە عیراق خۆی کیشەیە نەك وەك پیشوو دەووترا (المشکله الکوردیه)دوای (المشکله الشیعیه) ئیستاش (المشکله السنیه) ڕاستیەکەی ئەوەیە عیراق خۆی کیشەیە خۆی لەسەر بنچینەی تایفی دروست کراوە ،چارەسەریشی بە گوفتەی دیپلۆماسی و دیمۆگۆجی نابێت ،بلێی براین ولە ژێرەوە بیبڕیەوە ،دەروازەی چارە بەوە دەست پیدەکات کە دەستوریانە دان بەواقعی ڕاستەقینەی عیراق بهینین کە بریتیە لە 3 پیکهاتەی لیکجیا .

بە پێی بیریارانی نوێی کورد (هەندیٚ جار سونیەکانیش لەباری ئیستا وادەلێن) دەبیٚ پڕۆژەیەکی وا دابڕێژریٚ بۆ چارەنووسی عیراق زۆر (لامەکەزی) بێت و هەم هەرێمەکانی فیدڕالیش تەنیا لەسەر بنچینەی کوردو عەرەب نەبێت، ئەوەیان دیسان زیندووکردنەوەی نەخشەی کۆمەلاٚیەتیەکەیە کەکورد هەر زەرەری بووە لەوەتەی دروستتی بوونی عیراق لەسالٚی 1921 ، بۆیە عیراق بکرێتەوە سیٚ هەرێمی فیدرالی نەك دوو هەرێم کە زیاتر لامەرکەزی دەبێت، کورد هەر لە سەنگەری پێشەوەنابێت لە هەموو ئەگەرێکدا ...، دان بەوە بنریت عیراق لە دوو ڕەگەزو دوو تایفەی تەواو لیکجیا پیکهاتوە .

(54)

**نەزەریەی موئامەرە**- نظرية المؤامرة conspiracy theory

ئەوانەش دەگرێتەوە ( بروتوكولات حكماء صهيون، لوينز،رۆتارى، لعبە الامم، رێكەوتنى شريف-ماكماهۆن،محاكمەموسكو،حزب التحرير،معلومات التضليلية ،فوضى الخلاقة،سالۆنيك،سفارد،توقيە، مؤامرةاليهود الكبرى ، اليد الخفية The hidden Hand...)

موئامەرەو نەزەریەی موئامەرە لێك جيان ،هەلبەتە پيلان هەيەو بەردەوامە بەلام كە دەگۆترىٚ (نەزەریەی موئامەرە)بە ماناى كۆكردنەوەى زۆربەى هۆكارە ناوخۆو دەرەكيەكان بۆ فاكتەريك كە لايەنەكانى ڕوون نيە وەك ئەو هەمو هۆكارەى شەڕە براكوژيەكانى دواى (ح عوسمان) بدەيتە پالّ پيلانى(عبداللەى كوڕى سەبەئيكى ناديار) .

بەسروشتى خۆى ڕوداوو هەلوێستێك ئەو نەزەریەی لىٚ دەخولقىٚ كە هەمو لايەنەكانى لە و كەسە ديارنەبىٚ كە دەلىٚ ئەوەدەستيكى ناديار دەيكا، پيلانە،فيتى بێگانە ..، ناوەڕۆك ومەبەستى زاراوەى پيلان و(نەزەریەی موئامەرە)كۆنە بەلام وەك زاراوە دەگۆترىٚ يەكەم جار لەسالى 1920 بەكارهاتوە لەگەرمەى دابەشى ميراتى هەرچوار ئيمپراتۆرى روسياوسێى دۆڕاويش(عوسمانى –ئەلمانى –نەمسا)، دەشگۆترىٚ يەكەم فەرهەنگ ئەو زاراوەى بەكار هێنابێت قاموسى ئۆكسفۆردبوە،مەبەست لێى ئەوەيە كە هۆكارى ڕاستەقينەى هەندىٚ ديادەو ڕووداو (ئەوەندەى لێمان ديارنيە) دەيبەستنەوە بە لايەنى دەست رۆيشتووبەنهێنى ، هەنديكى ڕاستەو هەنديكى خەياليە ، عادەتەن ئەو ڕووداوانە لێلى پێوەيە لە پالنەرو ئامانجى ، هۆكارەكانيشى بە ڕوونى ديارنيە بۆ لێكجياكردنەوەى راست وچەوت بۆيە دۆخەكە دەپەڕێتەوە تيۆرو بۆچوون و پيشبينى ،تا ئيستاش چەندين ڕووداوى گەورە هەيە لە چوارچێوەى پيلان ونەزەریەی موئامرە باسى لێوەدەكرێت ،بەتايبەتى لەلايەن معارەزە بۆ دەسەلات چ لەسەر ئاستى ناوەخۆى دەولەتيك ،يان لەسەر ئاستى دەولى ..، لەنمونە كۆنەكان نيوان ئاينى مسيحى ويەهودى زاراوەى ماسۆنى وزايۆنى وئيستعمارو ،پرۆتۆكۆلاتى زايۆن،زۆر بەكاردێت ،جەنگەكانى

جیهانی تیرۆری ئەرشیدۆك تیرۆری کەنەدی ،لەو دواییەش رووداوی 11ی سیپتیمبەر، داگیرکردنی عیراق ،دۆزی فلستین وورووداوەکانی پەیوەست پێیەوە ،شۆرشەکانی کورد،لەو دواییە زاراوەیەکی تریش لەو بابەتە سەری هەلدا بەناوی (فوضی الخلاقة —یان- ادارة بالازمات[1508])..هەروەها لەرووداوە زانستیەکان پرسی (اطباق الطائرة) و (سیگۆشەی برمۆدا) و ..

زۆربەی جار لایەنی بالادەست بە ریکخستنی پیلان توومەت باردەکرێ وئەوەی پیلانیشی لێدەکرێ دەستەوتاقمەکانی خۆیان بە پاك ودلساف دەزانن یان ئاین وبنەمایەکی مرۆڤایەتی جوانیان هەلگرتوە ،جاریش وایە عەقلیك پۆلینی رووداوێك بە پیلان دەکا کە باش زانیاری لەبارەی نیە و دەلێ پیلانە ،کەچی دوای پەیداکردنی زانیاری لەو ڕایانەی پشیمان دەبێتەوە ،کاتی خۆی ئەوروپاش تووش ببوٍ خەلکی ئەوروپاو غەیرە ئیسلام دیاردەو پیشهاتەکانیان بە پیلانی موسولمانان لیکدەدایەوە ،هەر لەو چوارچێوەیە بوو ئەو سەعاتەی هارونە ڕشید بۆ شارلمانی فرنسی ناردبە پیلانی تیگەیشتون ووردو خاشیان کرد ،ئیستا ئەو هاوکیشەیە وەرگەڕاوە خەلکی ئیسلامی هەموو دنیای لیبوویتە پیلان ومو‌ئامرە ، کە دەزگای چاپ هاتە جیهانی ئیسلام بەفتوای زانایانی ئەستەمبۆل حەرام کرا،کەڕادیۆ هات بەهەمان شێوە ،چوونە سەرمانگ ،..لە ڕووی سیاسیش چەمکی دیموکراسی و مافی مرۆڤ ودەزگای عوسبەت ئومەم ودوای نەتەوە یەکگرتوەکان و زۆری تر بە پیلان وەسف کرا ،دوای کەزانیاری پەیدا بوو لێی پشیمان بوونەوە ،تەنانەت کە کلاوی سیدارە هات بۆ خۆپاراستن لە تیشکی رۆژ ووتیان ئەوە پیلانی یەهودی ومسیحیە بۆ ئەوەی موسولمان هەمو دەم ئاسمان وخوا نەبینی ،..لەو سەردەمە زۆربەی ڕووداوەکان لە نێوەندی عربی دەدرێتە پالْ پێلانی یەهود ،بۆیە کتیبەکانی نووسەرانی عرب پڕیەتی لە پەرەگرافی (الید الخفیة The hidden Hand) ، بەجم وجۆل ونەخشەو پلانی یەهودی (لە ئەقوال وپرۆتۆکۆلات) ووتراوە (مؤامرةالیهود الکبری) گوایە بۆ ئەوەی هەمو دنیا تیك

[1508] ئەوە جیایە لەگەل (ادارە الازمات) ئەوەیان چارەسەرە ,هەرچی (ادارە بالازمات)سود وەرگرتنی ئەزمەی یەکیکی ترە بۆخۆت وچۆنیەتی ئیدارە دانیەتی بۆ دریژکردنەوەی .

بدەن خۆیان حکومەتیکی جیهانی دروست بکەن[1509]، لەگەڵ زۆر بەسەرهاتی تری سەیر بریتین لە توخمی پێکهینەری نەزەریەی موئامەرە .

**سەربردەیەکی گشتی(نەزەریەی موئامەرە) لەناوچەکە** لەدوای ڕوخانی خیلافەتی عوسمانی زۆر ڕاستی سەرسوڕهێنەر بڵاوبۆوە لە شێوەی پیلان، لەوانە ئەو هەموو کۆنگرە و پەیمانانەی لەجیهان بە نهێنی بەستراون بۆ ڕووخاندنی ئەو خیلافەتە، ئینجا ڕێکەوتنەکانی سایکس بیکۆ 1916 و ئاشکرابونی پەیوەندی کۆمەڵێك سەرۆك و شێخی عەرەب بە بەریتانیا، دوای بلاو بوونەوەی (پرۆتۆکۆلەکانی زایۆن) و(چالاکیەکانی ماسۆنی) ناوە ناوە بلاو بوونەوەی ڕاپۆرتی هەوالگریەکان وزۆر ڕووداوی تر وای کرد زۆربەی سەدەی بیستەم عەقڵی ڕۆشنبیری ئیسلامی عەرەبی بەوە پڕبکرێتەوە کە ئەو جیهانە هەموو پیلان و سیناریۆیە دژ بە ئایین و دژ بە عەرەبە، تا ئەوساتەش هێشتا زۆربەی ڕۆشنبیرانی عەرەب ئەو کاریگەریەیان لەسەر ماوە، بەشێك لە ڕۆشنبیرانی کوردیش لەژێر کاریگەری فەرهەنگی عەرەبی باوەڕیان بەو تیۆرە هەیە، پێیان وایە ئەوەی ئێستا دەگوزەرێ لەو جیهانە بە نهێنی و ئاشکرایی هەمووی پیلانی ئیستیعمار وسەلیبی و زایۆنیی و ماسۆنی و ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتیە دژ بە ئەوان، تەنانەت هەندێکیان شۆرشی ئۆکتۆبەر و تەیاری مارکسیەت و شۆرشی ئێران و شۆرشی فەرەنسی و ... هەمووی بە پیلان دەزانی، بۆیە گومان لە هەموو ڕاستی و ڕووداوە واقعیەکانیش پەیدادەکات بەوانە دەگوترێ (ئەهلی نەزەریەی موئامەرە)،

لەڕاستیدا لەسەدەی (19) و سەرەتای سەدەی (20) و پێشووتر ئەو نەزەریە ڕاستی تیدا بوە و پیلان دژی ئایین و داگیرکردنی ناوچەکەهەبووە، هەر دۆسیەکی فەرمی لە ڕۆژئاوا بەناوی ( مسألە الشرقیە) هەبوە مەبەستیان چۆنیەتی لەناوبردنی خەلافەتی عوسمانی بوە، مەبەست دابەشی ناوچەکە بووە لەسەر بنچینەی نائایینی، کۆتایی بە جەستەی (ئومە) و (خیلافەت ) و (دار الاسلام) و ئەوانە بهێندرێت، هەموو جۆرە ئامرازێکیشیان بەکارهێناوە، لە کاتیکا خۆیان یەك دەخست کەچی جیهانی ئیسلامیان دابەش دەکرد، ڕۆژئاوا لەسەدەکانی 16 ـ 17لەگەڵ هەڵوەشانەوەی کنێسە هەوڵی یەکخستنی هەڵوێستی ئەوروپی داوە، لە سەدەی 17 لە کاتی جەنگی 30 سالەکە ئەنجومەنێکی

---

[1509] د عبدالوهاب المسیری —فی الخطاب والمصطلح الصهیونی ص24 ص29 .

بالاَی ئەوروپی دروستکرد، لە سالی 1713کۆنگرەی تریخت پێك هات بۆ دروستکردنی یەکیتی ئەوروپی، ئەو تەقەلایانە شانبەشانی پیلان وپارچە پارچە کردنی جیهانی ئیسلامی بەردەوام بوو تائەوان بە یەکیتی ئەوروپی ئێستا گەیشتن وجیهانی ئیسلامیش بە پارچە پارچەیی گەیشت، هەوڵ بەردەوامە خەڵکی تر پارچە پارچە بکەن و سوود لەبنەمای (فرق تسد) وەربگرن، بەشێك مێژووی نەزەریەی موئامەرە بۆ سەردەمی ئەرستۆ دەگێڕنەوە لە چوارچێوەی بنە ما ی (فرق تسد)،کە دە گە ڕێتە وە بۆ ئە و نا مە یەی (ئە سکە ندە ر مە کدۆنی) کە بۆئە ر ستۆی ما موستا ی نا ردو تیا یدا پر سیا ری ئە وەی کردبوو ئا خۆئە و خا کی فا ر سی دا گیر کردووە، بە لاّ م چۆ ن بتوانی بە سە ر دڵ و دە روو نی میللە تە کە ش زا ڵ بێت، لە وە لاّ مدا ئە ر ستۆ پلان وپیلانیکی بۆ داڕشت لەو وەلامەدا: پە رش و بلاّو یا ن بکە و بە سە ر یا ن دا زا ڵ بە..:نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، ... وەڵامی ئەرستۆ ..أشير عليك برأى هو أبلغ ، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم[برترهتر].

تەنها بۆ دابەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ولەناو بردنی خەلافەتی ئیسلامی نزیکەی 100 کۆنگرە وەك پیلانی نهینی کرا، (دین کروسیه) لەکتێبی (وجه اسیا) دەڵێت: ئەو تەقەلایانەی دابەشی عوسمانی وجیهانی ئیسلامی لە(معاهده کارلو فیجه 1699م )دەستی پێکرد،بەبەشداری (بریتانیا ـ فرنسا ـ روسیا ـ ئیتالیا)، بۆ سەرکەوتنی پیلانی داگیر و دابەشی یەکەم جار هەولیان داوە ئاینیان لاوازبکا، ریساو پلانی زۆر ئاشکرابوە لەلایەن دام ودەزگاو ریبەران دژ بە جیهانی ئیسلامی هەندیکی هەلدەبژێرین:(لورنس براون)دەلیّ گەورەترین دیوارلەپیش داگیرکار وئیستعمارئاینە[ترترهتر]، سەرکردەیە

---

[2] ـ بروانە: د كمال مزهر —كوردستان فی سنوات حرب..ص316 .
[1510] ـ ابن مسكويه– تجارب الأمم ج1ص23.

کی پورتوگالی لە1515ز لە ژێر دروشمی (کوژانەوەی نوری محمد) بەرەو جیهانی ئیسلامی هات،کلادستونی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا دەلیَ:لادانی قورئان لە میشکی موسولمان گرینتی مانەوەی داگیرکاریمانە ،ناتوانین جیهانی ئیسلامی داگیربکەین تا (قورئان) یان لەنێو دورنەخەینەوە ،هەمو ئەوانەش بەرجەستە ببو لە پیلان وچەواشەکاری وهەلخەلەتاندن ودووڕووی و ..، دوای سەرکەوتنیشیان فەلسەفەی ئینتیداب هاتە مەیدان بۆ دابەش و دیزاینی جیهانی ئیسلامی بەگشتی و رۆژهەلاَتی ناوەڕاست بەپیَ ی مقاسیدی سایکس بیکۆ دروست کراوبە نهینی وپیلان وبوە ، لە پرۆتۆکۆلەکانی یەهودیش ڕوون تر باسی پیلان کراوە، لە پرۆتۆکۆلی(11) دەلیَ تا بتوانین زال بین بەسەریانا دەبیَ(ان الأممين -غير اليهود- كقطيع من الغنم، وأننا الذئاب، فهل تعلمون ما تفعل الغنم حينما تنفذ الذئاب إلى الحظيرة؟ انها لتغمض عيونها عن كل شيء) لە برۆتۆکۆلی10 باس لە تیك شکاندنی ژیرخانی خیزانی دەکا(فسوف ندمر الحياة الأسريةبين الأممين، تفسد أهميتها التربوية)[1512] ،دوای ئەوانە ڕیکەوتنامەی شریف- ماکماهۆن ئاشکرا بووکە لە سالی 1915 گرێیان دابوو بە نهینی لەگەل هەوالگری بریتانی ، دوای ئەوانەش مووچەی شێخە عەرەبەکان کە نهینی بوو ئاشکرا بوو ، زۆربەی ئەو شیخانە لەژێر سایەی عوسمانی بون موچەیان لە بەریتانیا هەبو، یەکەم جار گۆڤارێکی بە هێزی ئەو سەردەم بەناوی (شؤون خارجية) کەلە لەندەن دەردەچو لەمانگی 1927/1ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسكريت) لیستێکی موچەی مانگانەی ئەمیروشێخ وکەسایەتی عەرەبی تێدا بلاَوکرایەوە، دوای هەریەکەیان بە ئاشکرا خەلات کران،لەوەش زیاتر وولاتانی عربی لەسەر بنچینەی ئەو پیلانە گەورانە دروست بوون،بۆ هەر پیلانگێڕێك وولاتیکیان دروست کردو مەلیك وسەرۆکیان بەو تەرازوە بۆ دیاری کرد، زیاترو تایبەتی تریش ڕوی لە بنەماڵەی مەلیك فەیسەل بو، بە نهێنی لەدوای دروستکردنی ئەو دام و دەزگایانە بەریتانیا بڕیاری دا لە پاداشی ئەو هەمو چاکەیەی بنەماڵەی (الشريف حسين بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە 1916 قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس رۆیشت،بە پێی بەلێنی بەلفۆری 1917، لەو

---

[1512] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980بروتوكول رقم:(10 ،11)

[1512] مدخل الى الفلسفة ص47 ،49

پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی بە (وسام النصر) و (صليب الحرب مع النجل) خەڵات کرا[1513]، ئەوکاتی هەر وڵاتێك بۆ سەرۆك یان مەلیکێکی عەرەبی دیاری بکرابایە دەبوایە پاڵپشتێك لەلای ڕێکخراوی زایۆنی بە نهینی بهێنێت، لە دوای دروست بوونی ئیسرائیل و هەندی جەنگی لەگەل عرب زیاتر نهینی وخیانەتی دەسەلاتدارانی عەرەب ئاشکرا دەبوو ..ئیتر ئەو تیۆرە(تیۆری پیلان) زیاتر پتەو دەبوو ،بەتایبەتی گومان لە جم وجۆلی بەریتانی گەیشتە ئەو ڕادەی بگۆترێ ئەگەر دوو ماسی لە دەریا بەشەڕ هاتن دەستی بەریتانیای تێدایە .

**سەرەنجامی ئەو پیلانانە:** هەموو ئەوانەبە ڕاستی پیلان بوون،نەزەریە نەبوون ,واتە پیلان وموئامەرەی ڕاستەقینە بوون ، تا ئەو کاتە تەواوی بەرنامەکانی سایکس بیکۆ و بەلێنی بەلفۆر و لۆزان  جێبەجێ کرا بەوشێوەیەی خوارەوە :

یەکەم:دروستبوونی دەوڵەتۆکەکانی عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست .

دووەم دەوڵەتی ئیسرائیل  لە 1948 جێگیربوونی.

سێ یەم: لەناو چونی یەکجارەکی خیلافەت و چەمکەکانی دار الاسلام و ئومەی ئیسلامی..

دوای ئەو هەنگاوانە قەبارەی پیلان بەو ڕادەی جاران نەما ،بەلام گومانی ڕەوشەنبیران زیاد دەکا، قۆناغێکی نوێ دێتە پێش ،ئیتر پیلان دژ بەکێ بکرێ، ئەوانەی دەسەڵاتدارن زۆربەی هەرە زۆری لایەنگری خۆیتیان، بنکەی سەربازی لە وڵاتانی وەك سعودیە و ئیمارات و قەتەر و ئوردن هەیە، زۆربەیان پەیماننامەی ئاشتیان لەگەڵ ئیسرائیل هەیە، تەنانەت لە ئابلۆقە خنکێنەرەکەی سەر غەززە ئیسرائیل و عەرەب بەیەکەوە بەشداربوونە، کاتێ ئێران شۆرشی کرد وڵاتانی عەرەبی لەجیاتی ئیسرائیل و ئەمریکا لەگەلی جەنگان، لەکاتی جەنگی غەززەی 2009 و ئیسرائیل رێکخراوی فەتح و سعودییە و ئوردن پاڵپشتی ئیسرائیل بوون، ئیتر پیلان دژی کێ بکرێت، کەچی گومان ونەزەریەی

---

[1513] هەمان س ص122 (يضيف فورستر ان بوانكارية –رئيس وزراء فرنسا وملك بريطانيا عندما قلدا الوسام وإعتبره حليفا لهم بما قدمه من الخدمات، ومن الجانب البريطانيا إستقبله ملك جورج الخامس ومنح وسام فكتو ريا الملكى لخدماتـه الإضـافيةوالدور المذكور فى هدم الخلافة وتسهيلاته لتنفيذ وعد بلفور وتوقيعه المعاهدة مع وايزمن حول منح فلسطين لليهود).

موئامەرە هەر زیادی دەکردلە میشکی ڕەوشەنبیری عەرەب، لە ڕاستیدا لەو سەردەمی پیلان لەسەر ئیسلام وعەرەب بەو پلەیە نەبوە بەلکو ئەوجارە ڕووی لە شیوعیەکان بوە، کەچی کار بەنەزەریەی موئامەرە زیاد لە پێویست دەکرا ، تەنانەت هەندێ بۆچون لەچوارچێوەی ئەو نەزەریە دەبیندرێ لەوانە پێك بەستنی مارکسیەت و ماسۆنی و زایۆنی[1514]، پێکبەستنی خومەینی و رۆژئاوا و پێکبەستنی قاعیدە و ئەمریکا، مارکسیەت فەلسەفەیەکی دژ بە سەرمایەداری و ئیستیعمار، بەرجەستە بوونی لەسەربازگەی سۆڤیەتی خەریکبو بەرەی رۆژئاوا تێکبشکێنێ چۆن بە پیلان سیناریۆ هەژماردەکرێت، ئەوە سەرەتای لۆژیکی لەدەست دەدا، تەنانەت لەسەردەمی سۆڤیەت ئەوەندە کاریگەری لەسەر جیهان هەبو لەقازانجی فەلەستینی (الصهیونیة شکل من اشکال العنصریة )دژ بە ئیسرائیل دەرچوو لە نەتەوە یەکگرتوەکان: بڕیاڕی ژ:1904ی خولی 18سالی 1963 پێك هاتبوولە(11)مادەی بەناوی جاڕی نەتەوەیەکگرتوەکان دژ بە ڕەگەزپەرستی ، هەروەها خودی حزبی شیوعی ئیسرائیل(راکاح)زیاتر هەلویستی ولاتانی سۆشیالیستی دەگرتەبەر نەك حکومەتی ئیسرائیل، لە پەیڕەوی ئەو حزبە زایۆنی بە ڕەگەزپەرست وەسف دەکردلە کۆنگرەی (16)ی جەنگی حوزەیرانی بە دریژکراوەی ئیستعمار وەسف کرد [1515]، مەکسیم رۆدنسنی یەهودیەو لە چەپی

---

[1514] لە کتیبی (خطر الیهودی –محمدخلیفة یونس ص36) واهاتوە : معظم اعضاء المجلس الشیوعي الذي یحکم روسیا الآن (سنة 1951) من الیهود الصرحاء. فالأعضاء سبعة عشر هم: ستالین رئیس المجلس، وکاجانوفیتش نائبه، کم بیریا، وفیرشیلوف، ومولوتوف، وشفیرنیك، وکیرتشینسنین، وجورکین، والیا ایرهمیرج، ودیفنسکي، وهینسیرج، ومیخلیس، وفرمین، وجودي، ولوزوفسکي، وکافتانوف، وبیتر لیفنتسکي. وهؤلاء یهود صحراء الا ثلاثة منهم: ستالین، وفیرشیلوف، ومولوتوف. ولکن زوجات الثلاثة یهودیات، وفیهم یهودي الأم أو الجدة أو صنیعة مجهول النسب من صنائع الیهود، کما أن أسماء کثیر من الیهود بینهم مزدوجة فلکل منهم اسمه الیهودي الأصیل المستور، واسمه الحرکي المشهور الذي یخفي الاسم الیهودي الأصیل، وهذه عادة کثیر من الیهود حیث احتاج الأمر إلی التخفي أولاً، ولو لم یکن داع إلی التخفي اخیراً،فیبقی الاسم المزیف المشهور دون الاسم الأصیل المغمور، والحرکة الشیوعیة عامة حرکة یهودیة، فمؤسسها هو الیهودي کارل مارکس وهذا بعض صلات الیهودیة بالشیوعیة النظریة والعملیة في روسیا وغیرها من البلاد. (انظر کتاب "روسیا الیهودیة" وتأمل الشعار الیهودي البلشفي في صدر هذا الکتاب وحوله النجمة المسدسة وهي شعار علم إسرائیل ).

[1515] بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە : اللقاء لماذا هوغیرممکن مع یسارفی اسرائیل-محمداسماعیل نصیف ص67-68 هەروەها بڕوانە دەقی (مقررات المؤتمر السادس عشر للحزب الشیوعی الاسرائیلی-راکاح- هەروەها ئەودەقانە لە مجلەی (الهدف) ژ:2 بلاوبوویتەوە ,گۆڤاری هدف بەرەی میلی فلستینی بەسەرۆکایەتی جۆرج حەبەش دەردەچوو .

فرنساو لایەنگری مافی فلستینیەکان بوو،تاکە بەڵگەی لاوازی ئەو بۆچۆونە ئەوەیە لە پرۆتۆکۆلەکانی (حکماء الصهیون) دەڵێ مارکس و فرۆید و... لەدروستکراوی ئێمەن.

ڕاستی وناڕاستی ئەو نەزەریە

نەزەریەی موئامەرە کاتی خۆی ڕاستی هەبوەوەك لەسەروو باسمان کرد، ئێستاش هەندێ بەشی تری ڕاستی هەیە و ئەو جیهانە بی پلان و پیلان نیە، بەڵام هەمووی ئەوا نیە، بۆ ڕوداوەکانی ئیستادوو ڕای پیچەوانە هەیە لەبارەی بوونی پیلانی بەنهێنی دژ بە میلەتان وئاین ودەستەو تاقمەکانی خۆیان بە پاك ورزگارکەر دەزانن ،بەشێك پێیان وایە ئەو جیهانە هەمووی لەسەر پیلان دەڕوا ،بەشەکەی تریش پێیان وایە ئەوەی ڕوودەدا ڕاستەقینەیەو پیلان نیەو بەلکو ئەوە عەقلی دواکەوتووە ئەو تووەمەتە دەخولقێنێ بۆ مەبەستیکی سیاسیو ئاسایشی ،دەیکاتە پاساو بۆ لیدانی نارازیەکانی خۆی ... لە ڕاستیدا هەردوو لا هەم هەلەن هەم ڕاستن بەلام بە ڕێژەیی ، پیلان هەبوە بەلام بەو ڕادەیە نیە

لە گەرمەی قەیرانی موشەکەکانی سۆڤیەت لەکۆبا ئەمریکا مناوەرەیەکی سەربازی کردبەناوی(ORTSAC) لە دەریای کاریبی بۆ دورگەیەك کە تیایدا پادشایەکی دیکتاتۆر لەناودەبات ،ئەگەر ئەو ناوە بەلە ڕاستەوە بۆ چەپ بخوێنیەوە دەبینی ڕێك(کاسترۆ)دەردەچی ،کەواتە ئەوە نەزەریەی موئامەرە نیە ئەوە ڕاستیە مانای چیە ،ئیتر خویندنەوەی نوسینی هەلگەڕاوەیی لەو کاتیەوە دەستی پیکردوە .. ،نە ئەو دنیایە ئەوەندە ساغ بوە پیلان وتاکتیکات نەبووبێ نەئەوەندەش گوماناوی بێت هەمووی بەپیلان وەرگری ،جاروایە کاریکی خێرخوازیش گومانی لێکراوە ،ئەو پیلان وگومانانە زیاتر لەکاتی جەنگی ساردو گەرمی وا کە درێژە دەکیشی سەرهەلدەدا ،بۆیە ئاساییە لەوکاتانەی کە ئاین وخەلافەت هەبوە ئەو گومان وتیۆرە بوونی هەبووبێت بە فراوانی ،بەهەمان شێوە لەسەردەمی جەنگی ساردی نێوان شیوعیەت وسەرمایەداری ،بەلام لەباری ئیستا خەلافەتی ئیسلامی ڕووخاوەو جیهانی ئیسلامی دابەش بووینە،بە تایبەتی وولاتانی عرب لە ژێر هەیمەنەی رۆژئاوان

پیلانی چیان لێبکرێ،لەلایەکی تریش لە کۆتایی سەدەی بیستەوە شیوعیەتیش تێکڕووخاوە،بەجۆریك کە ئەگەری گەڕانەوەی نیمچە مەحال بێت،ئەوەش پیلان و ڕێکەوتنی نهێنی دژی پیویست نەماوە ،ئەوەی بواری هەبوو پیلان ودژایەتی بکرێت ئیران وبزوتنەوە ئیسلامیەکان بوو ،ئەوانیش ئەوەندە پەرتەوازە بووینە لەو دواییە پیویست بە موئامرە نەماوە ،دابەشی سیاسی ومەزهەبی وتایفی وئیقلیمی و ..ئینجا گەڕانەوە بۆ کیشە کۆنەکان وخۆبەستنەوە بە فقهی کلاسیکی وای کردوە فاکتەری گەشەی خۆی بوەستێنێ لەناوەخۆ پیویستیەکی وای بەوە نەماوە (ماسۆنی وزایۆنی وئیستعمار..)پیلانی لێبکەن ،بۆیە ئەوەی ئیستا باسی پیلان وریکەوتنی نهینی دژ بە خۆیان دەکەن بەشی هەرە زۆری خولقێندراوە ،هەندێ نمونە لەو پارادۆکسانەی تووشی ئەو جۆرە عەقلیەتە دەبێ باس دەکەین:

- باس لە مارکسی دەکەن وەك پیلانی یەهودی لەوانە (موسوعة المذاهب الفكرية ) کەچی مارکس کتیبیکی هەیە تایبەت بە (مسألە اليهوديه) چی بە یەهودی دەکا ، ئینجا گەورەترین بڕیاڕ لە نەتەوە یەکگرتوەکان دژ بە ئیسرائیل یەهود دەرچوو لەسەر دەستی مارکسیەت وسۆڤیەتی پیشوو ، ئەوەبوولە 15/ئۆکتۆبەری 1975 بڕیاڕی (الصهیۆنیە شکل من اشكال العنصريه)دەرچوو لە نەتەوە یەکگرتوەکان ،دوای کە مارکسیەت و سۆڤیەت نەما لەخولی (30) ی کۆمەلەی گشتی 1996 هەلوەشیندرایەوە.
- بزوتنەوەی کوردی بە پیلانی ئیستعمارو زایۆنی ناوزەد کراوە کەچی خۆی کوشتەی ئیستعمارولەدابەشی ئەو هاتوە .
- شۆڕشی ئیرانی وبزوتنەوە ئیسلامیەکان وئیخوان وحماس .. هەمو ئەوانە ئەوتوومەتەی دراوەتە پاڵ .
- ئینقلابی میسرو لەودواییەش بوهاری عربی بە پیلانی ئیستعمارو (تقسيم المقسم)هەژمارکراوە ،سەلاح موختار لە تویژینەوەیەکی (متلازمة امريكا —هل هو ربيع العربي ام سايكس بيكو الثانية) دەلێ بوهاری عەرەبی گەورەترین پیلانە لەلایەن ئەمریکا بەسەر عەرەب

و سایكس پیكۆی دوەمە ، لەكۆتایدا ماوە ئەوە بڵێین پیلان هەبوەو هەیەو دەیشمێنیٚ ،بەلام تیۆری پیلان(نەزەریەی موئامەرە)بۆ ئەو سەردەمە ڕاست نیە كە هەمو دیاردەو ڕوداوو دام ودەزگاكانی جیهانی بە پیلان تێبگەی .

**یارمەتیدەری عەقلیەتی نەزەریەی موئامەرە:** پیلان هەبوەو پانتاییەكی فراوانی مێژووی كۆن ونوێی داگیركردوە ،ئەو هەمو پیلانانەی دژ بە پیغمبەرەكان كراوە ،لە قورئانیش باسی پیلانی كردوە ،ئیستاش ماوە بەرجەستە بوە لە دەزگایەكی دیاری كراوی هەر دەولەتێك بەناوی (هەوالگری – مخابرات)،ناكریٚ نكولی لیٚبكریٚت ،بەشێكە لە سیاسەتی دەولی ،هەرمەدرەسەو سیستەمێك بە ڕێژەیەك بەكاری دەهێنیٚ ،ئاین باوەڕی بە پیلان نیە تەنها لە كاتی جەنگی نەبیٚت (الحرب خدعە)، هەرچەندە هەندیٚ سەربردە دەگێڕدرێتەوە لە سیرەی پیغمبەران بەلام واپیٚدەچی دروست كراو بیٚت وەك پاساو بۆ هەندیٚ دەسەلاتی پاش خۆیان بۆ بەكارهێنانەوەی ،لە ماركسیەت شرعیەتی پیٚدراوە لە چوارچێوەی ئەسلێك پیٚی دەوتریٚ (تاكتیك وستراتیژیەت) ،لە باقی مەدرەسەو سیستەمەكانی تری (نامەبادیئی) زۆر بەفراوانی بەكارهاتوەو دیٚت، دەزگای هەوالگریش لەدەولەت تایبەتە بەو پرسە، بۆیە نەزەریەی موئامرە تەنها لەعەقلیكی گوماناوی نەهاتوە،سەرۆكی ئەمریكا (رۆزفلت)خۆی دەلیٚت لە سیاسەت سودفە نیە بەلكو پیشتر نەخشەی بۆ كێشراوە ،بۆیە بنچینەی خۆی هەیە، بەلام ئەوەی زیاد لە پیٚویست عەقلیەتی هەندیٚ بیریارو توێژەرو خەلكی ئاسایی داگیركردوە هەندیٚ ڕووداووبەلگەنامەی مێژوویە ،هەندیكیان لیٚهەلدەبژێرین كە زیاتر كاریگەریان لەسەر جیهانی ئیسلامی ورۆژهەلاتی ناوەڕاست هەیە:

- كاریگەریەكانی ریكخراوی ماسۆنی كەدەگۆتریٚ لەوەتەی مرۆڤ دروست بوە ئەو ریكخراوە گوماناویە هەیە ،یان بەلای كەم دەلین 4000 ساڵ (پ.ز)هەبوەو هەر خەریكی پیلان بوە ، لەلایەكی تریش لە پرۆتۆكۆلی ژ:4 دەلیٚ ئیمەی یەهودی ماسۆنیمان دروست كردوە یەكجاری عەقلی عەرەبی وموسولمانی خستۆتە قەیران ،ئینجا دەنگۆیەكی زۆر هەیە دەڵێن زۆربەی ڕووداوە گرنگەكانی جیهان لە دروستكراوی ماسۆنیەتە لەوانە:- ڕابوونی ئەوروپی، شۆرشی فەرەنسی، شۆرشی ئۆكتۆبەرو شیوعیەت، سەربەخۆی ئەمەریكا، هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، جەنگەكان،

سایکس بیکۆ .. تا دەگاتە درووست بوونی دەزگا جیهانیەکانی وەك (عصبە الامم و UN) ... دەیانەوێ بڵێن مێژوو لەلایەن ماسۆنیەتەوە دادەڕێژرێ،جاروایە زاناو موجاهیدو خەباتگێڕی گەورەش دراوەتە پاڵ ئەو ریکخراوە وەك جمال الدینی ئەفغانی ومحمد عبدە کە بەیەکجاری عەقلی ئاینی تەواو دەخاتە گومان . لە (موسوعەیەکی ئیسلامی) زۆربەی جەنگ و شۆڕش وڕاپەڕینەکانی ئەوروپای داوەتە پال ماسۆنی وەك جەنگەکانی 70سالەی ئەڵمانی وفرنسی ،ئینقلابەکەی 1908ی بەسەر عوسمانی ،جەنگی دیهانی یەکەم، ئەوە بیت ئەوروپا ئەوەندە دادگەری بێت پیویستی بە شۆرش وچاکسازی نەبیت [1516].

- زۆربەی پانتایی سەدەی بیستەم ململانێی رۆژهەلات ورۆژئاوا بوو ،کەچی کۆمەلێك ڕێکەوتنامەی سەرسوڕهێنەر لەلایەن هێزە دژبەیەکەکان،وادەکا ئەهلی نەزەریەی موئامەرەبکا گومان لەهەمولایەك بکات ، بەنمونە یەکیتی سۆڤیەت لەسەردەمی ستالین چوەڕیکەوتنیك لە 24 ئۆگستی 1939 لەگەل ئەڵمانیای سەردەمی نازی ،کە بە (حلف مولوتوف-ریبنتروپMolotov–Ribbentrop Pact ) ناوزەد دەکرێت یان هاوپەیمانی (ستالین-هیتلەر) ، نمونەی دوەم دابەشی جیهان لە نێوان ستالین وچەرچل لە 1943/10/9 لە مۆسکۆ بۆوولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات (یۆنان ورۆمانیاو مەجەروبولگاریا..)[1517]

- کاریگەری هەندێ ڕیکخراوی بە ڕوالەت خیرخوازبوەو لە ژێرەوە مەبەستی تری هەبوە ، نمونەی باو ریکخراوی لوینزە ،بەو کۆمەلە یانە خیرخوازیانە دەووترا (لوینز)کە سەر بە دامەزراوە ماسۆنی ویەهودیەکان بوە بۆ بلاوکردنەوەی گەندەلی ولەناو میلەتان تا بەسەریان دا زال بێت لە ڕێی خێرخوازی ، لەسالی 1915 لە ئەمریکا دروست بوە ، شان بەشان وبەهاریکاری یانەکانی رۆتاری ، دەگۆترێ دوای ئەوەی ریکەوتنی ئاشتی ئیسرائیل و میسر (سادات وبیگن)مۆرکرا ئەو یانانە بە فراوانی لە میسر بلاو بووینەوە ،(مەجمەعیکی فقهی )چالاکی ئەوانەی بە حرام پۆلین کردوە .

---

[1516] الموسوعة الاسلامية العربية ج11 ص269 .

[1517] بۆ زیاتر لەبارەی ئەو دابەشیەی چەرچل وستالین بڕوانە: جوزیف سیراکوسا-الدبلوماسية-ت:كوثر محمودمحمـد،ط1 2015، مؤسسة هنداوی —قاهرة ص67.

- بەهەمان تەوژم لە (پرۆتۆكۆل حكماء صهيؤن) پڕوپاگندەی لەو شێوەی تيايە ،دەڵێ هەر لە شيوعيەت و شۆرشی فەرەنساو ئۆكتۆبەر ...هەتارێكخراوی ماسۆنی یەتیش دروستكراوی ئێمەیە، پيشبينی كەوتنی قەيسەری روسيا وسيستەمی پاشايەتی لە ئەوروپاو..دەشلێن جەنگەكانی جيهان وسەرەنجامەكانی و ديزاينی نوێی جيهانی وبەتايبەتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە پلان وپيلانی ئێمەیە —زۆريشی دەرچوو، ئەوەی زياتر هانی ئەو گومانە دەدات هەندێ لايەنی هاوبەشی ماسۆنيەت و زايۆنيەت وهەندێ لای تری جيهانی ،هەر بەنمونە دروشمی ماسۆنی ( يەكسانی-برايەتی —سەربەستی)* دەبينين دروشمی شۆڕشی فەڕەنسی (سەربەستی —برايەتی-يەكسانی)، درشمی (ئيتيحاد الترقی )يش خەلافەتيان داڕوخاند بريتی بوو لەو سێكوچكەيە ( يەكێتی —سەربەستی —چاكسازی )، دروشمی( حزب البعث) يش (يەكێتی-سەربەستی-سۆشياليستی) .. زۆری تريش،هەمو ئەوانە دەكەونە ژێر گومانی پيلان كاتێ لە پرۆتۆكۆلی ژ:1 دەلێت (كذلك كنا قديماً أول من صاح في الناس "الحرية والمساواة والاخاء) .
- وەك چۆن باسی هەردوو پرۆژەی ماسۆنی وپرۆتۆكۆلات هەولی ئەوە دەدەن عەقلی جيهانی واتيبگەيەنن كەئەوان زالن ولەژێرەوە هەمو دام ودەزگاكانی سەردەم لە دروست كراوی ئەوانە ,رۆژئاواش جاروايە ناڕاستەوخۆ وادەلێت ، كتيبەكەی مايلز كويلاند (لعبة الأمم -1969)، (مل ملانێی شارستانی-هندگنۆن)، (كۆتای مێژوو-فۆكوياما) (سەركەوتنی بێ جەنگ-نيكسۆن) (دبلوماسيە-كيسنجر)..كتيبە مخابراتيەكانی تر..،كار گەيشتۆتە ئەوەی فلميك بەناوی (نەزەريەی موئامەرە)لەسالی1997لەلايەن(ريتچارددۆنەر) دەرچوە ،هەموی واپيشان دەدەن كە ڕووداوەكانی جيهان لەڕوالەت بابەتيكەو لەراستەقينەدا بابەتيكی ترە ،ميلەتانی كەمدەست واليێدەكا لە هەمو ڕوداوە كۆنەكان ونوێيەكان بەگومان دەبێ .
- لە قورئانيش باس لە پيلان كراوە (إنَّ الملأ يأتمرون بك ليقتلوك فاخرج إني لك من الناصحين) ،..
- دانەرانی قوميەی توركی وعربی غەيرە خۆيان بووينە ،ئەوانەی لەسەر تەوەری توركايەتی ئيشيان كرد لە نێودەولّەتی عوسمانی بەشی هەرە زۆری لەوانە لە بنەچەدا يەهودی بون كە بەيەهودی سالۆنيك ناوزەد دەكران ، ئەوانەی لەسەر تەوەری عروبی ئيشيان كرد بەشی هەرە زۆری مەسيحی

* لە كتيبی (جمهوريە افلاتون )يش ئەودروشمە( سەربەستی و يەكسانی ) بەدی دەكری

بووینه لەوانە: محمد عزه دروزه، بنەماڵەی بستانی، سلیم یازچی، جۆرج ئونتۆنیۆس، نجیب عازوری، ناسیف یازجی، میشیل عفلق،شوبلی شمیل، سلامه موسی...ئەو بەشە زیاتر عەقلی میلەتانی موسوڵمان وداعیەکانی خستە گومانی زۆر گەورە کە هەرچی هەیە پیلانە ،(جورج کیرك )خاوەنی کتیبی (A short History Of the Middia East ) دەڵێ پرۆژەی ناشیۆنالیزمی عەرەبی لە ( دار المندوب السامي البريطاني) دروست کراوە ، بەهەمو پێوانەیەك عەرەب خۆیان خاوەنی پرۆژەی عربی نەبووینە،هەتا بەعسیەکانیش دەڵێن یەکەم تەقەلای یەکخستنی عەرەب لەلایەن غەیرە عرب بوە باس لە تەقەلاکانی محمدعلی پاشادەکەن لەنێوان( 1805ـ 1847)بۆ ئەومەبەستە .

- لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم وکۆمەلیك مەلەفدارئاشکرا بوون کە پیاوی گەورەی دەولەتی عوسمانی بوون کەچی لە ژێرەوە پەیوەندیان بە بریتانیا هەبوە ،بەشیکی پیاوی ئاینی زۆر گەورەش بووینە (زۆربەیان عرب بوو) مووچەی مانگانەیان بەو شێوەیە بوو: 1 ـ ابن السعود 100.000 جنیە، 2 ـ ملك حسین ـ شریف مکه ـ 100.000 جنیە، 3 ـ فهد الهذال 140.000 ربیە، 4-السید الأدريسي12.000 لیرە..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژیەی بۆ بەریتانیا دەیکەن[1518]، هەروەها بریتانیاپاداشی ئەو هەمو چاکەیەی ملك فیصل وتێکڕای بنەماڵەی (الشريف حسين بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە 1916 قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس رۆیشت، لەو پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی بە (وسام النصر) و (صلیب الحرب مع النحل) خەڵات کرا [1519]..ئەوانە هەمو شۆکی عەقلی موسوڵمان بوو کاریگەریەکی زۆری بەجیهیشتوە کە عقلی عربی وابیربکاتەوە کە سەرکردەو ڕێبەرەکانی هەر خائین بن لە ژێرەوە .
- دوای لیستێك ناوی ڕێبەری گەورە لەلایەن بریتانیاوە ئاشکرا کران وەك پاداش بۆ چاکەکانیان

---

[1518] عبدالرزاق الحسنی - تأريخ الوزارات العراقية -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92

[1519] هەمان س ص122 (يضيف فورستر ان بوانكارية –رئيس وزراء فرنسا وملك بريطانيا عندما قلدا الوسام وإعتبره حليفا لهم بما قدمه من الخدمات، ومن الجانب البريطانيا إستقبله ملك جورج الخامس ومنح وسام فكتو ريا الملكى لخدماته الإضافيةوالدور المذكور فى هدم الخلافة وتسهيلاته لتنفيذ وعد بلفور وتوقيعه المعاهدة مع وايزمن حول منح فلسطين لليهود).

کاندید کران بۆ بوون بەمەلیکی عیراق ،ناوی کەوڕی سولتان عبدالحمیدیشی تێدابووئەوانی تریش: (عبدالرحمن نقیب، تالّب نقیب، هادی العمری، خزعل بن الحسین، برهان الدینی کوڕی سولّتان عبدالحمید، غولام رەزا والی پشتگوی ئێران، ئاغاخان ڕابەری ئیسماعیلیەکان...، لەگەلّ هەندێك پالّێوراوی تر کە برسی کۆکس لە نامەیەکدا لە ڕۆژی 1921/7/6 بۆ بەریتانیای نارد[1520]،دووبارەگومانەکانی فراوان کردو نەزەریەی موئامرە زۆر ڕەسەن کرا لە ڕووداوو لە مێژووشدا .

- کۆمەلێك ڕێکەوتنی نهێنی کرا کە لە قازانجی ئیستعماری ولەزیانی میلەتان وزیانی خەلافەتی ئیسلامی بوە ،بەدەیان ریکەوتن وکۆنگرەی پیلان دژی عوسمانی کرا ،بەشیکی ڕێبەرو سەرکردەی جهانی ئیسلامی تێدابوە هەندیکیان زانای گەورەی وەك (محمدی کوڕی عبدالوهاب)تێدا بوە ، ریکەوتن لەگەل شێخەکانی کەنداو بەمەبەستی دروستکردنی دەولّەتۆکە بەپێی ستانداردی بەریتانیا بوە، لە پێش هەمویان ڕێکەوتنی قەتیف پیکهاتبوو لە (7)مادە لە 12دیسمبری 1915 ، هەروەها ڕێکەوتنی تر لەگەل شیخەکانی کەنداو، لەوانە: بەریتانیاو (قواسمەکان) لە 6/فبرایر/1806، دووەم لە11 /ینایر/1820 لەگەل شیخەکانی (رأس الخیمە، ابوظبی، بحرین، عجمان، ام القیوین، ..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە1892..، بەلینیان بە بەریتانیادا، کەئەوبراگەورەیان بێت لە هەمو ئیش وکاریکی ناوەو دەرەوە بەتایبەتی کاری نەوتی[1521]، پیشوو تریش لەسالی 1737ز بە سەرپەرشتی ڕێکەوتنامەیەکی نێوان (حمدی کوری ئال سعود و ئیمام محمد بن عبدالوهاب) کرد[1522]، لە میسرسش ڕێکەوتنی وا لە 19 ینایر و 10 یولیو/1899گرێدرابوو، لە سالی 1915ش ڕێکەوتنی شریف لەگەلّ ماکماهۆنی بەریتانی مۆرکرا، بوە هۆی سەرکەوتنی گەورەی بەریتانیا بەسەر خیلافەتی عوسمانی...دووبارە شۆك کردنی عەقلی مونەزیری ئیسلامە بەو دۆخە پیلاناویە ،بە جارەك متمانەیان بەیەکتر نەما .

---

[1520]- تاریخ الوزارات- ص53

[1521]- دەقی ڕێکەوتنەکان لەکتێبی ایران والخلیج العربی ص42- زۆربەشیان بەپەنجە مۆریان کرد خوێندەواریان نەبوو.

[1522]- جری في عام 1737م إتفاق بین العالم الدیني محمد بن عبدالوهاب مع حمد بن سعود علی ان یتولی الأول الإمامة الدینیة والثاني زعامة الدولة د.صالح العابد –حرکة الأستقلال العربی، رسالة الماجستر –جامعة المستنصریة، بغداد1988 ص12-13(هذە الأتفاقیة مشهورة بتحالف الوهابی السعودی)

لەوانەش مەترسیدار تر دوای دەرکەوت بۆ دروست کردنی هەر دەولەتیکی عربی ئەوکاتی هەر ولأتێك بۆ سەرۆك یان مەلیکێکی عەرەبی دیاری بکرابایە دەبوایە پالپشتێك لەلای رێکخراوی زایۆنی بهێنێت، لە چوارچێوەی ریکەوتنیك لەگەل نوێنەری ئاژانسی زایۆن بۆ ئەوەی یەهودیەکان بتوانن بێ رێگری بۆفلستین کۆچ بکەن تادەبنە زۆرایەتی حوکمیشی دەگرنە بەر، مەلیك فەیسەل لە 1919/5/3 رێکەوتنێکی لەگەل (حایم وایزمان) مۆر کرد پێکهاتبو لە 9مادە تیایدا دان بە ئیسرائیلی داهاتوو دەهێنێ لەبەرامبەردا دەکرێتە مەلیکی عیراق، دەقەکەی لەخوارەوە[1523]، لەسەر

3اتفاقية فيصل-وايزمان: هي اتفاقية وقعت في 3 يناير1919 ,, بين الأمير فيصل (ابن ملك الحجاز) و حاييم وايزمان (فيما بعد رئيس المنظمة الصهيونية العالمية)، كجزء من مؤتمر باريس للسلام, 1919 وهي تعطي لليهود تسهيلات في انشاء وطن في فلسطين والإقرار بوعد بلفور.

نص الإتفاقية

إن صاحب السمو الملكي الأمير فيصل ممثل المملكة العربية الحجازية والقائم بالعمل نيابة عنها والدكتور حاييم وايزمن ممثل المنطقة الصهيونية والقائم بالعمل نيابة عنه يدركان القرابة الجنسية والصلات القديمة القائمة بين العرب والشعب اليهودي ويتحقق أن أضمن الوسائل لبلوغ غاية أهدافهما الوطنية هو في اتخاذ أقصى ما يمكن من التعاون سبيل تقدم الدولة العربية وفلسطين ولكونهما يرغبان في زيادة توطيد حسن التفاهم الذي بينهما فقد اتفقا على المواد التالية:

1- يجب أن يسود جميع علاقات والتزامات الدولة العربية وفلسطين أقصى النوايا الحسنة والتفاهم المخلص وللوصول إلى هذه الغاية تؤسس ويحتفظ بوكالات عربية ويهود معتمدة حسب الأصول في بلد كل منهما.

2- تحدد بعد اتمام مشاورات مؤتمر السلام مباشرة الحدود النهائية بين الدول العربية وفلسطين من قبل لجنة يتفق على تعيينها من قبل الطرفين المتعاقدين.

3-عند إنشاء دستور إدارة فلسطين تتخذ جميع الإجراءات التي من شأنها تقديم أوفى الضمانات لتنفيذ وعد الحكومة البريطانية المؤرخ في اليوم الثاني من شهر نوفمبر سنة 1917.

4- يجب أن تتخذ جميع الإجراءات لتشجيع الهجرة اليهودية إلى فلسطين على مدى واسع والحث عليها وبأقصى مايمكن من السرعة لاستقرار المهاجرين في الأرض عن طريق الاسكان الواسع والزراعة الكثيفة. ولدى اتخاذ مثل هذه الإجراءات يجب أن تحفظ حقوق الفلاحين والمزارعين المستأجرين العرب ويجب أن يساعدوا في سيرهم نحو التقدم الاقتصادي.

5ـ يجب أن لا يسن نظام أو قانون يمنع أو يتدخل بأي طريقة ما في ممارسة الحرية الدينية ويجب أن يسمح على الدوام أيضا بحرية ممارسة العقدية الدينية والقيام بالعبادات دون تمييز أو تفصيل ويجب أن لا يطالب قط بشروط دينية لممارسة الحقوق المدنية أو السياسية.

6ـ إن الأماكن الإسلامية المقدسة يجب أن توضع تحت رقابة المسلمين.

7ـ تقترح المنظمة الصهيونيةأن ترسل إلى فلسطين لجنة من الخبراء لتقوم بدراسة الإمكانيات الاقتصادية في البلاد وأن تقدم تقريرا عن أحسن الوسائل للنهوض بها وستضع المنظمة الصهيونية اللجنة المذكورة تحت تصرف الدولة العربية بقصد دراسة الإمكانيات الاقتصادية في الدولة العربية وأن تقدم تقريرا عن أحسن الوسائل للنهوض بها وستستخدم المنظمة الصهيونية أقصى جهودها لمساعدة الدولة العربية بتزويدها بالوسائل لاستثمار الموارد الطبيعية والامكانيات الاقتصادية في البلاد.

8ـ يوافق الفريقان المتعاقدان أن يعملا بالاتفاق والتفاهم التأمين في جميع الأمور التي شملتها هذه الاتفاقية لدى مؤتمر الصلح.

9ـ كل نزاع قد يثار بين الفريقين المتنازعين يجب أن يحال إلى الحكومة البريطانية للتحكيم وقع في لندن، إنجلترا في اليوم الثالث من شهر يناير سنة 1919 .

ئەو بنچینەیە(شكری غنام)سەرۆكی وەفدی سوری لە1919لەبەرامبەر كۆمیتەی ئاشتی ڕێككەوت، دوای ئوردەن بەڕاشكاوانە تروادروست بوو بەرامبەر دان هێنان بە ئیسرائیل ، وەك دەق لە ( الموسوعە السیاسیە )ئاواى وەسف كردوە :( ان شرق الأردن لم یكن كیاناً وفقا لمشروع التقسیم، إلا أن ( تشرتشل ) عقد صفقة مع الأمیر ( عبدالله بن الحسین ) بواسطة لورنس، لیشمل المشروع إقامة إمارة له في شرق الاردن، مع إعانة مالیة سنویة من بریطانیا مقابل تعهد ( عبدالله إبن شریف مكة ) بقبول السیاسة البریطانیة في فلسطین ))[1524].. دروست تر بلین ئەو وڵاتانە بە ڕوالەت چاكەیە بۆ عەرەب كەچی لە بنەچە بۆ دژی یەكێتی عەرەب وبۆ پاریزگاری ئیسرائیل دروست بووینە، لە كتیبی(الحكام العرب فی مذكرات مخابرات العالم) دەلیت پیش جەنگی (ایام الستە) سالی 1973 مەلیك حسین بە سواری كۆپتەرو بەتاقی تەنها لە عەمانەوە بەرەو تەلئەبیب میوانی گۆلدەمائیر دەبیت وهەمو نهینی شەڕەكەی میسرو سوریایان بۆ ئاشكرا دەكات ودەلیت لە 6ی ئۆكتۆبەر هیرشەكەیان دەست پیدەكەن ودەگەریتەوە عەمان [1525]، لەدوا هیرش ئیسرائیلیش بۆ سەر غزە لە (2009 وڵاتانی ئوردن و میسرو سعودیە و دەسەڵاتی فلستین لایەنگیری ئیسرائیلیان كرد، تائەو ساتەش ئابلوقە خراوەتە سەر فلستین لەلایەن عەرەب خۆی..

سەربردەی زۆرهەیە لەكوردستان لە دوای دروست بوونی ئیسرائیل خەلكی وەك جیهاد بۆ شەڕی فلستین چووینە لەلایەن رژیمە عربیەكان گیراون ،لەكتبی(حول خط الاستراتیجی) ئەوباسانە دووپات دەكاتەو دەلیٚ ئەو رژیمانە زیاتر ئەركیان رزگاركردنی فلستین نەبوە بەلكو شۆرشگیرانی فلستینی چەك بكەن[1526] .هەر لەو كتیبە(ص106) دەلیٚ لەسالی 1936 رژیمە عربیەكان شۆرشی فلستینیان ئابلوقەداو كوژاندیانەوە لە جیاتی بریتانیا ،هەر ئەورژیمانەش بریاری دابەشی فلستین وجیگیركردنی دەولەتی ئیسرائیلیان خۆش كرد،دەشلی رژیمی ئوردەنی لەهەموان خراتر بوو ،هەر دروست بوونی

---

[1524]عبدالوهاب كیالی –الموسوعة السیاسیة طبعة الثانیة بیروت 1993، ج 3 ص453

[1525] مجدی كامل- الحكام العرب فی مذكرات زعماء وقادة ورجال مخابرات العالم ص359-360.

[1526] ناجی علوش-حول الخط الاستراتیجی العام لحركتنا ولشورتنا ص86

ئوردەن بەمەرجی پاسەوانی لە ئیسرائیل بوە .بۆیە بریتانیا بەشیکی لە فلستین بە ئوردەن داو وەریگرت (زیفەی غربی) ص107 وص112.

- تەبشیری وئیستعمار- لە داگیرکردن ودۆزینەوەو چوونیان بۆ ناو میلەتانی تازە دۆزراوە لەویٚ ئیستعمارو تەبشیری مسیحی ڕێك بوون لەقازانجی هەردوو لابوو ،هاندانی پاپاو پیاوانی ئاینی بەردەوام بوو ..لەو بارەیەوە بڕوانە (جان ثؤل-المستکشفون فی القرون الوسطی)
- یەهودیەکان زۆر جێگەی گومان بووینە،ئەو یەهودانەی ترساون یەهودیایەتی خۆیان دەرببڕن پێیان وتراوە سفارد(یهودمتخفون) ..لە ئیسپانیاو پورتوگال بەو یەهودیانە دەڵین مارانۆ[1527]، هەندێ جار ئازادیان نەبوە ناچار ئاینداریان شاردۆتەوە کەچی بۆ ئیستا بوویتە مادەیەك بۆ پتەو کردنی عەقلی پڕ لە گومان و وابزانن ئەوەش پیلان بوە .
- لورنس بە دۆستی عەرەب بەناوبانگ بوو زۆربەی دەولەتە عربیەکان بە یارمەتی وپلانی ئەو دروست بوە کەچی لەژیرەوە کاری بۆ پارچەی عرب و ئاین کردوەەولە یادەوەرەکانی خۆی ووتویەتی هەولمداوە ناشیۆنالیزمی عربی جێی ئاینی ئیسلام بگریتەوە[1528].
- بەهەمان شیوە (هامفەر)یش لە یاداشتەکانی خۆی لەگەل محمدی کوڕی عبدالوهاب کاری وای ئاشکرا کردوە موسولمان باوەڕومتمانەی زۆر لەرزۆك دەبێت و هەموی بە پیلان تێدەگا،تەنانەت ناوبراو دەلێت جاریکیان دوکانداریکی برادەرم لەئەستەمبۆل بوو زانیاریم لیٚ وەردەگرت بۆ دەولەتی خۆم(بریتانیا) ئەو دوکاندارە داوایەکی سیکسی ناخۆشی لیکردم ،منیش وەلامم بۆ بریتانیا نارد ووتم ئەو داوایە دەکات لەوەلاما ووتیان ئەگەر ئەو کارە خزمەتی بە ئامانج گەیشتنت دەکا لاریمان نیە[1529] ،خۆ جاریکیان وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل(لیڤنی –ئافرەتیکی جوان بوو)ووتی لە پێناو دەولەتی ئیسرائیل کاری سیکسیشم کردوە .

---

[1527] بۆ زیاتر لەوە: ... الموسوعه الیهود والیهودیه والصهیونیه ج1 ص86 .

[1528] الامام امجد الزهاوی-المعهد العالمی للفکر الاسلامی ص45

[1529] دالیمانی الفخرانی –مذکرات هامفر ص17

- لە عیراق لە دوای دروست کردنی دەولەتی عیراقی مستر کۆکی بریتانی سەرپەرشتیاری ئەوقاف بوە ، بۆیەکوردوشیعە نەچووینە ژێر ئەو بارەو هەریەکە مەدارسی ئاینی خۆیان دوور لەحکومەت بەڕێوە بردوە[1530] ، ئەوە یەکجاری گومانیان لە تەواوی دەولەت دروست بوە خودی دەولەت بە پیلان دژ بە ئاین تێبگەن، بەهەمان شێوە ئەو هەمو یارمەتیەی ناپلیۆن بۆ ئەوقاف وجامیعەی ئەزهەر وای خۆ پیشان دەدا کەلەوان دلسۆزترە بۆ ئیسلام تاوای لێهات شیخی ئەزهەرو ئەنجومەن دەیان پرسی ئەریٚ ناپلیۆن وسەربازانی بۆ بەتەواوی نایەنە ناو ئاینی ئیسلام[1531] ؟!

لەلایەکی تر لەنامەکانی مس بیل(کە بەدامەزرینەری عیراق هەژماردەکریت)بۆ بریتانیا داوایەك دەکات لەنامەی رۆژی 1920/10/3دەلێت با مەرجەعەشیعەکان وئاینیەکانی جیهانی ئیسلامیش وەك دەسەلاتی پاپا قەتیس بکەین لەناوچەیەکی وەك ڤاتیکان ئینجا سیاسەتەکانی بریتانیا لە عیراق وناوچەکە سەرکەوتوو دەبێت[1532]،واتە داگیرکاری و بە عەلمانی کردن ولاواز کردنی ئاینیان پیکوە بەستوە .

- هیزی بەریتانیا هاتۆتە ناوچەکە بە جەنگ ومەسروفیکی زۆر بەریتانیا رابەری ئیستعمارو خاوەنی هەلگری وەسفی هندی (ئەگەر دووماسی لەدەریا بەشەر هاتن دەستی ئینگلیزی لەگەڵە)، لەئەوروپا بێت (سالانەی جەنگەکەیان 35 ملیۆن جونیەی تێبچێت) و خوێنێکی زۆر بڕێژی (تەنها لەعیراق 10000 کوژراوی هەبوو) (1533)، بێت کۆمەڵە دەوڵەتیك دروست بکا ناوی بنیٚ عیراق و ئوردەن و .....، خۆی مەسروفی وەزارەتەکان و سوپاو حکومەت دابین بکا.... و بگەرِێتەوە شوێنی خۆی..، حەتمەن ئەو هەنگاوە دەیان مەبەستی شاردراوەی لەپشتە .

---

[1530] الامام امجد الزهاوی-المعهد العالمی للفکر الاسلامی ص17

[1531]بۆ ئەو سەربردەیە بڕوانە : مانسفیلد – تاریخ الشرق الاوسط ص84

[1532] العراق فی رسائل مس بیل ص188

[1533]ـ کۆتلۆف- ثورة عشرین ص177

- کۆمپانیای بریتانی (شرقی هند)فەرمانبەرانی خستە کۆلیجیك لەسالی 1800 تا شارەزای رۆژهەلات وئاینی ئیسلام بن ،تەنانەت زانستی سیاسیشیان دەخوێند ..هەلبەتە ئەوە ڕوونە کەمەبەست لە کاری ئەو کۆمپانیایە تەنها سەرمایەداری نیە بەلکو کاری سیاسیشی هەیە[1534]

- لە ئەوروپا چەندین کۆمەلەی زانستی دروست کرا بەمەبەستی سیاسی وئیستعماری ،یەکەمەکەیان (الجمعیة الثقافة والفنون والعلوم ) لە 1778ز ، دوەمیان (جمعیە بنغال الاسیویە الملکیە ) ئینجا جمعیەالملکیە الاسیویە وزۆری تریش[1535]....

- هەمو دەزگا هەوالگریەکانی دەولەتان کاریان پیلان وسیخوڕی وزانیاری وەرگرتن وخۆ دەرخستن بەجۆریك وناوەڕۆکیش بە جۆریکی تر زیاتر ئەو نەزەریەیە تۆخ دەکاتەوە بەتایبەتی بۆ جیهانی عەرەبی کە لە پرۆتۆکۆلی ژ:17 باس لەو دەزگا هەوالگریانە دەکاو دەلیٚ ئیمە دروستمان کردوون وسەر بە ئیٚمەن .

- کاریگەریەکانی (بروتوکولات ، ریکخراوی ماسۆنی و کتیبەکەی مایلز کویلاند: لعبة الأمم - 1969)،کتیبە مخابراتیەکانی تر.. ، لەگەل زۆر ڕۆلی تری گوماناوی وەك رۆلە نهینیەکانی هەندی زانگۆی ئەمریکی ،ڕۆلی (العاب اولمبیە) ، ڕۆلی کۆمەلە خەیریەکان ،دیپلۆماسەکان ,موستەشریقەکان ....وای لیٚهات تەنانەت گومان لە زانست وزانیاری و کەل وپەل و بیسی وکۆلاش کراوە ، گومان لە وەرزش و بۆ نمونە کتیبی ( دورة الألعاب الأولومبیة . . وثنیة معاصرة في ثیاب ( العولمة )ئەوە عنوانی کتیبیکە ،هەمو ئەوانەزیاتر عەقلی ئەوانەی تیکداوە ،تاوای لیهاتوە گومان لە بزوتنەوە ئیسلامیەکانی تریش بکەن بۆ نمونە زۆربەی عەقلی ئیسلامی کوردستان کە لە عربی وەرگرتوە وا تیدەگا کە قاعیدەو داعش سەر بە ئەمریکاو ئیسرائیل و ئیران وزۆر شوینی تر،لەهەموی گرنگتر هەمو موسولمانان بە فتوای جیهادهەستان بۆپاریزگاری لە

---

[1534] عبدالرحمن بدوی- موسوعة المستشرقین ص475

[1535] موسوعە المستشرقین ص188 .

خەلیفه ودارالاسلام کەچی خەلیفه هەبوه سەودای لەگەل کافر کردوه دژی موسولمانان، هارِوونه رِشید داوای یارمەتی له شارلمان دەکرد دژ به معارەزەکانی خۆی له ئەندەلوس تارِادەیەك خەلیفەی عەباسی لەدژی صلاح الدین ،تارِادەیەك نێوانی سولتان سەلیمی سێیەمی عوسمانی ولویسی شازدەمی فرنسی و لەو دواییەش سولتان محمود دژ به معارەزەکانی خۆی (محمدعلی پاشا له میسرو میری سۆران لەکوردستان )داوای له بالمرستۆنی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا کرد بەهانای بیت دوای داوای له رِوسیاش کرد[1536]،لەهەره دوای ناوی مندالەکانی ئەو خەلیفانەبۆ پادشاو سەرۆك له لیستی بەریتانیا کاندید بوون ، لەکۆنگرەی پاریسی 1902/2/4 دژ به خەلافەت به سەرپەرشتی برازای(سولتان عبدالحمید- صباح الدین)بوه،ناوی زانایانی وەك(جمال الدینی ئەفغانی ومحمد عەبده)له لیستی ماسۆنی دێت ، ناوی مارکس و داروین ونیتچەش لەپرِۆتۆکۆلی ژ:2ی(بروتوکولات حکماء صهیون)هاتوه،دواخەلیفەکان هەلاتنه ئەوروپا نەك مەکه ومەدینه ..ئیتر ئەوانه نەزەریەی موئامرەی زۆر تۆخ کردوه له عەقلیەتی بزوتنەوه رِادیکالیەکان زیاتر.

<u>**عەقلی گومانی پیلان**</u> ئەوەی سەروو وای کردوه به فراوانی نەزەریەی موئامره پێگەی له حیساباتی سیاسی وستراتیژی بۆ بکرێ،بەلام زۆر جار هەیه وەك دەرد نیه بەلکو دەزانن پیلان نیه، بەکاری دەهێنن بۆ پاساویك یان دەربازکردنی خۆیان له شکستێك یان بۆ لیدانی معارەزەکانیان ، جاران حزبه شیوعیەکان زۆر باسی پیلانی رەجعی وبورجوازی ورۆژئاوایان دەکرد، له سەردەمی ستالینیش به ناوی پیلان دادگا رِێکخرا بۆ نەیارەکانی به ناوی (محاکمه مۆسکۆ له 1936-1937 )دژی ئەوانەی معارەزەی ستالین بوون به ناوی پیلانگێرِی وبەفیتی حکومەتی ئەلمانیای نازی وهتلەر دژ به ستالین ، هەریەکه له ترۆتسکی وزینۆفیف وکامینیۆف وریکۆف وبۆخارین و..فەرمانی تیربارانیان بۆ دەرچوو ، زۆر نمونەی تری وا هەبوه لەلایەن ئەوانەی عەقلیان وابوه ئەوان ئەوانه ئەوەنده گرنگن خەلك له پیلانه لێیان .

---

[1536]بۆ ئەو سەربردەیە برِوانە : مانسفیلد – تاریخ الشرق الاوسط ص81 وص101

ئیستا زیاتر بزوتنەوە ئیسلامیەکان ،لەوانیش هەتا توند تربن زیاتر بەلای نەزەریەی موئامەرەن، حزبی تحریر الاسلامی هەمو جۆرە ئینقلاب وگۆڕانیکی دەسەلاتی عربی گێڕاوەتەوە بۆ پیلان وگۆڕان لەو کرێگرتیە بۆ کریگرتیەکی تر لە (قاموس حزب التحریر) زیاترین ئەو نمونانە دەبینین ،تەنانەت تەواوی ڕوداوەکانی نیو عەرەب دەداتە پال ئەو تیۆرە، هەتا ئینقلابی حزبی بەعسی 1968 بۆ ئینگلیز دەگیڕیتەوە تا ڕووخانی لە 2003ز وەك خۆی واهاتوە: ( ..في عهد عبد الرحمن عارف، إلا أن رجال الإنجليز من البعثيين وغيرهم قد سيطروا على الحكم عام ١٩٦٨ م، واستمرنفوذ الإنجليز في العراق حتى ٠٩ / ٠٤ / ٢٠٠٣ م لدى سقوط بغداد)[1537]، جار وایە خودی بەکریگیراوانیش ئەوە بەکاردەهێنن ، لەکوردستان خەلکە بەکریگیراوەکانی دەزگای حکومی سەردەمی بەعس **دەیان** ووت هەرئیمە کریگرتە نین ،سیناریۆیەکیان دەهۆنیەوە دەیان ووت بەچاوی خۆم (ناوی سەرکردەیەکیان دەهینا –زۆر جار ناوی مام جلالیان دەهینا) بینیومانە لای (مدیر امن) ،ئەوە لەدوو سەرچاوە دەهات جاروابوو لە دەزگای ئەمن بۆیان دروست دەکرا وەك(معلومات تضليلي) بۆ ئەوەی بیئومید بن وسوور بن لەسەر بەدکاریەکانیان ،جاریش وابوو بەدکار خۆی دەیهۆنیەوە بۆ ئەوەی لە نامۆیی دەرچێ وبلێ ئەوەتە پیشمەرگەو سەرکردەکانیش بە کریگیراون ،ئەو تەقەلایە لەسەر ئاستی ئیقلیمی ودەولیش هەبوەو هەیە ،وەك توومەتی بزوتنەوەی کورد بە ئیستعمارو زایۆنی لەلای رژیمە عربیەکان کە خۆیان لەبەدکارەکانن ، ئینجا هەمان توومەت بۆ ئیخوان ،ئینجا گوایە هاوپەیمانیەکی سەفەوی ومەجوسی وزایۆنی وشیعی وئەمریکی دژی عرب!! ، دەبێ بوەستین لەسەر چەمکی(معلومات تضليلية) چونکە ئەو جۆرە مەعلوماتە بە ئاسانی لە فەزای (نەزەریەی موئامەرە)سەرکەوتوو دەبێت،کەواتە بەشێکی ئەو زانیاریانەی دێت ( زانیاری هەڵخەڵەتێنەر – معلومات تچليليە) واتە زانیاری دیزاین کراو ڕەوانەی نێو خەڵکی ئیسلامی ( یان میلەتێکی داگیرکراو و یان بێ ئاگا) دەکرێت لەکەناڵێکی تایبەت .. وادەزاندرێ ئەوە زانیاری دەستکەوتویی تایبەتە، کەچی مەبەستی هەیە لەو زانیاریانە نیشانەکەشی دەپێکێ لەژێر سایەی (نەزەریەی موئامەرە) .

---

[1537] قاموس حزب التحرير– المادة: شرق الاوسط .

لەلایەن ئیسلامیەکان زۆربەی جم وجۆلەکانی ئەمریکای بە پیلان لەقەلەم داوە هەر لە حم وجۆلە فەرهەنگی ورەوشەنبیری و ،مافی ئافرەت ودیالۆگی ئاینەکان وئاشتی و ..بۆ زالکردنی سەرمایەداری تەنانەت وەسفی (نەتەوە یەکگرتوەکانیش بە دەزگایەکی نەفامی وپیلان وەسف دەکرێت - الأمم المتحدة – الهيئة الجاهلية القانونية العالمية)[1538]... هەلبەتە شوعیەکانیش هەمو جۆرە جم وجۆلیکی ئەمریکی ورۆژئاوایی بە پیلان وەسف دەکەن ... ئەوانە هەمو تیکەل کردنی زانیاری وبەکارهێنانی نەزەریەی موئامرەیە بۆ چەواشەکردن وتیکدانی زیاتری عەقلی سادەی ناوچەکە،لەو تێکەلیە چۆن ڕاستی وناڕاستی ڕووداوەکان لیکبکەینەوە پیویستی بە زانیاریەکی سەرەتایی لۆجیکی پەیوەندیە نیودەولەتیە نوێیەکان پێویستە ،ئینجا پیویست بەوەش دەکا سروشتی ئەولایەنانە دیاری بکەین بەکورتی:

1-ئەولایەنانە عادەتەن لایەنی ڕادیکالن پەیامیکی گۆڕانکاریان هەلگرتوە نەخشە ڕێگەکەیان زەحمەتە .

2-لەو سەردەمە زیاتر بزوتنەوە ئیسلامیەکانن بەتایبەتی ئەوانەی بە عەقلی عربی کاریگەرن، ،یان زیاتر ئەوانەی رادیکالن ،کەمێکیش پرۆژە ناشیۆنالیزمەکان دەگریتەوە ،

3-لەسەر ئاستی دەولی ئەو وولاتانە دەگریتەوە کە موعارەزەی عەولەمەو سەرمایەداری وهەیمەنەی رۆژئاوان , لەسەر ئاستی ناوەکیش زیاتر ئەو جۆرە معارەزەیە دەگریتەوە کە بە یاساییانە بواریان پینەدراوە کاربکەن .

4-بەشیکی تر ئەوانەن کە عەقلیان کورتی هێناوە بەتەواوی وینەئالۆزەکانی پێناخوێندرێتەوە ..بە خێرایی تەسلیمی نەزەریەی موئامەرە دەبێت ، نەزەریەی موئامرە مادەیەکی خۆشە بۆ فاشیل وشکست خواردوان هەروەها بۆ عەقلیك کەسەری لە رووداوە راستەقینەکان دەرناچی ، کوردی هەژار قڕ کرا کەچی ئەگەر پەنجەیەك راست کاتەوە بۆ مانەوەی خۆی دەلێن ئەوە پیلانی زایۆنی ورۆژئاوایە ،دەلێن رۆژو مانگ وئەستیرەو رۆژئاواو رۆژهەلات وکوردوعوجەم لە پیلاندان ..دژی

---

[1538] مفاهيم سياسية لحزب التحرير ص27 .

[1539] الشيخ رفاعي سرور–التصور السياسي للحركة الإسلامية ص78 .

کیٚ؟ دژی عەرەب ،کەچی کە چاوت دەکەیەوە دەبینی ڕێك پیچەوانەیە، ئەوەنیە هەموبنکە سەربازیەکانی رۆژئاوا لە وولاتانی عربیە ،هیرشەکان بۆسەر عیراق هەموی لەلای عرب هات،ئەوەی ئابلوقەکەی بەسەر غەزە تەواو کردوە هەر عربە..هتد.

**سایکۆلۆجیەتی عەقلی موئامرە**: هەر جارەی لەلای میلەتانیکەوە ئەو بۆچوونە بوویتە سەرمەشقی تویژینەوەو شیٚکردنەوەکانیان ، فەرهەنگی(Amodern Dictionary Political Analiysis ) پیٚی وایە ئەو دیاردە زیان بەخشەکانیش ددەدەنە پال پیلان، دەلی لەسەردەمی بلاوبوونەوەی شیوعیەت لە ئەمریکاش ئەو دەردە بلاو بوویەوە، لە ناو عرب هەولدراوە چینیك بە کریگرتەو تاوانبار..[1540]، لە میژووشدا هەولدراوە شیعەوعەجەم بۆ دیاردە ناشرینەکان توومەت باربکەن...جاران خەلکی ئەوروپاو غەیرە ئیسلام دیاردەو پیشهاتەکانیان بە پیلانی موسولمانان لیکدەدایەوە ،هەر لەو چوارچیٚوەیە بوو ئەو سەعاتەی هارونە ڕشید بۆ شارلمانی فرنسی نارد بە پیلانی تیگەیشتون ووردو خاشیان کرد ، ئیستا ئەو هاوکیشەیە وەرگەڕاوە خەلکی ئیسلامی هەموو دنیای لیٚبوویتە پیٚلان وموئامەرە ، ئەو دەردە ئیستا زیاتر کەوتۆتە نیٚو عەرەب بەهەردوو بەشی ئیسلامی و ناشیۆنالیزمی ،وای لیٚهاتوە لیٚکدانەوەی دیاردە میٚژوویەکانیش بەو ڕوانگە سەقەتە بکەن ،لە میژووشدا هەولدراوە شیعەو عەجەم وغەیرە عەرەب بۆ دیاردە ناشرینەکان تاوان بار بکرین بەو پیلانە ، ئەگەر چی زۆربەی ئیسلامی چالاك وبزوتنەوە ئیسلامیەکانی شیعەو سونە ئەو دەردە زیادەڕەوەیان هەیە ،لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئیرانی 1979 لەویش ئەو نەزەریە باوی وەرگرتوە ،بەلام نمونەی زەق لەو سەردەمە لەناو عەقلی عربی نەزەریەی موئامرە زۆر بلاوە ،بۆیە هەلوەستەیەکی تایبەتی لەویٚ دەکەین ،هۆکارەکەشی ڕوونە ،چونکە زۆرترین ئەوخالانەی لەسەروو باسمان کرد (یارمەتیدەرەکانی تەئسیلی عەقلی پیلان) لە جیهانی عربی ڕوویداوە ،هەر لە ڕیٚکەوتنەکان وبەلینی بەلفۆرو دروست بوونی دەولەتی ئیسرائیل و دابەشی عرب وشکستیان و زۆرهۆکاری تر کەلەسەروو وتران ،بۆیە عەقلی عربی (ئەوانەی بەو عەقلەش کاریگەرن لە میلەتانی تر) گومانایە وزۆربەی ڕووداوەکان لە چوارچیٚوەی

---

[1540] المعجم الحديث للتحليل السياسي ص96 .

نەزەریەی موئامرە لیکدەداتەوە ،بۆیە هەندێك لە گەورە مونەزیرەکانیان عەقلی عربی بە قەیران وەسف دەکا ، مکسیم رۆدنسن لە کتیبی(العرب) باس لە عەقلی پڕلە پیلانی دەکاو دەلیٚ عەقلیکی هەلچوانەیە وادەزانیٚ کە:(عەرەب ئومەتیکی نەجیبن ولای خودا بەرزترن لە میلەتانی تر ، خاکەکەشیان خاکی پەیام وپیغمبەرانە، بۆیە پیلانی بەردەوامیان بە نهێنی وئاشکرا لیٚکراوەو دەکریٚ ،ئامانجی ئەو پیلانە گەورەو فراوانەش لەناوبردنی ئەو روحەیە کە ئومەی عربی هەلیگرتوە )، ئیتر لەو چوارچیٚوەیە پەنجەی توومەت بۆ زۆر لای میژووی و واقیعی دریژ کراوە گوایە خۆیان پاك بووینەو نانیان بیٚخویٚ بوە خەلکی تر پیلانی لیکردوون ، لە هەندیٚ تویژینەوەی تر دەردەکەویٚ بە پیٚی عەقلی پیلاناوی عربی ئەوە یەکەم پیلان دژی عرب لە کۆنگرەی نهاوندی سالی 641ز دیٚت، هەندیکی تر بۆ پیش ئیسلامیشی دەگێڕنەوە ،انور جندی گەورە بیریاری عربی وئیسلامی لە (الاسلام فی مواجهة الفلسفات القديمة) دەلیٚت : ماسۆنی فلسفەیەکی قوولی هەیە بریتیە لەکۆی بیرۆکەکانی بەشەریەتی کۆن،لەدوای ئیسلام جاریکی تر بەرجەستە بوویتەوە بە بەرگی هەرە نویٚ ،بەلام هەمان ئامانجی مەجوسی ومازدەکی ومانەوی پیش ئیسلامی هەلگرتوە[ترشمهتر]، گوایە ئەلقەی دوەمی ئەو پیلانە لەرۆژهەلات ورۆژئاوادەست پیدەکا، هەلمەتەکانی خاچپەرستان(1095-1291)لە رۆژئاوا و هەلمەتەکانی مەغۆل (1235-1260) لە رۆژهەلات، ئیتر ئەلقەی پیلان بەردەوام بوە دژی عرب تا دەگاتە لیسەندنەوەی حوکم وخەلافەت وکەوتنە بەردەستی عەجەم(لە کوردو فارس وتورك ومەملوك..) ئینجا دابەشی عرب و بەلینی بەلفۆر و تا ئەو ساتەش لە چەندین لاوە پیلانیان لەسەرە ،لەلای( ئیستعمار – زایۆنی-سەلیبی-مەجوسی-ئەجنەبی-کەمایەتیەکان-کورد-شعوبی-..)،جاروایەبزوتنەوە یسلامیەکانیش بە پیلان لەسەر عرب وەسف دەکریت لەلایەن ناشیۆنالیزمە عەرەبەکان , پەیوەندیدارە بە قەیرانی عەقلی ودواکەوتەیی وکەمزانیاری وخۆبەگەورەزانین و..

ڕاستیەکەی پیلان دژ بە ئیسلام هەبوە زۆربە خەستی وسەختی ،بەلام کەمتر دژی عرب هەبوە ،زۆربەی جار پیچەوانە بوە لە هەلمەتی خاچپەرستان بۆسەر جیهانی ئیسلامی زۆربەی میرنشینە

---

[1541] الموسوعة الاسلامية العربية ج ص27011 الاسلام فی مواجهة الفلسفات القديمة –الكتاب الثانی –انور الجندی

عەرەبەكان هاریكاری خاچپەرستان بوو ،ئەوە هێزی كوردە رزگاریان..لەسەردەمی نویش لەجەنگی جیهانی یەكەم نەك پیلان دژی عرب نەبوو بەلكو زۆربەی ریبەرانی عرب بەشیك بوون لەو پیلانانە .

لەو سەردەمە ئەوانەی دەردی (نظرية المؤمارة)ی ماوە كەسانێن زۆر شارەزاییان بە جیهانی نوێ و سیاسیەی دەولی و یاسای دەولی و پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەكان و سیاسەی دەرەوەی وڵاتان و بەرژەوەندیە باڵاكانی ئابوری نیە، زانیاریەكانی كلاسیكیە و كاریگەرە بە زانیاری سەدەی ڕابردوو و تاڕادەیەكیش بە عەقڵی عەرەبی پڕ قەیران،كەسان وتاقمیكن پڕ لەگومان گەلی جار كاری كارەساتاویان ئەنجام داوە لە ئەنجامی بەد گومانی و مەزەندەی هەلە، یان بە دوای تیۆری هەلەی وەك:تقسيم المقسم و تجزئه المجزأه ..پیلانی زایۆنی وماسۆنی و هەوالگری ..تەنانەت ئەو توومەت ومەزەندەیە دەدریتە بزوتنەوە رزگاریخوازەكانی وەك كوردیش كە ئەنفال وكیمیایی كراوە، كەچی ئەگەر بەرگری لە خۆی بكا دەلین ئەوە پرۆژەی ئیستعمارو زایۆنیە دژی وولاتانی عربی! بینیشتان(لە بەشەكانی تر) چۆن وولاتانی عربی (عیراق وسوریاوئوردەن وسعودیەو ئیمارات..)دروست بووینە چۆن ئیستعمار پیلان لەوولاتی وا دەكا. لەسەدەی بیستەمودوایش لەگەل لە ناوچوونی سۆڤیەت و جەنگی سارد پەیوەندیەكان بەو شیوەیە نەماوە ،تەنانەت شیوازی سیخوری وكریگرتەیی وەك جاران نیە ،ئیستا مەدارجیۆسی هەیە.

زیانەكانی : هەمو دەم پیویستە حیساب بۆ پیلان ونەخشەی بەرامبەر بكرێت ،بەلام كە گەیشتە تیۆری خەیالی و مەزەندەداری و(نەزەریەی موئامەرە) ئەوە تووی كۆمەلێك زیان دەبیت ،لەوانە :

5- نەزەریەی موئامەرە بە زیادەڕەوی بناغەی قەیرانی عەقلی پیك دەهێنیت چ بۆ تاك چ بۆ دەستەو تاقم ودامەزراوە گەورەكان .

6-وات لیدەكا بە سەقەتی لە واقع و هۆكارو داهاتووش بگەیت قەبلاندنەكانت بە هەلە دابچی ، وەك ئیمامی علی بەو دۆخانە دەلێت :( ... كالسراب، يقرب اليك البعيد ويبعد عنك القريب).

7- وات ليدەكا دۆست ودوژمن لێك نەكەيەوە .

8-وات ليدەكا نەتوانى ريزبەنديەكان (ترتيب اولويات)بكەی، گەلیَ جار ئەوەليت لێدەبيتە سانەوی و بە پيچەوانەش .

9-زۆركاريگەری تری سەلبی هەيە وەك (تەتبيق )دوو نمونە دەهينينەوە أ –يەكيان لە سالی 1948 نەتەوە يەكگرتوەكان بڕياريكی باشی بۆ فلستين دەركرد(لە چاو ئيستا) كە شان بەشانی ئيسرائيل دەولەتی هەبێت كەچی عەقلی موئامەرە ووتيان خودی نەتەوە يەكگرتوەكان پيلانەو ئەو دەرفەتەيان لە دەست چووو ئيستاش هەر لەهەولی گەڕانەوەی ئەو دەرفەتەن . ب- لە كوردستاننيش كاتی حزبە كوردستانيەكان سوديان لەو بۆچوونەی عەقليەتی موئامرەی ئيسلامی كوردستان وەرگرتبوو پيیان دەووتن هەر ئيوە هەبن ئەمريكاو رۆژئاوا كوردستان تيك دەدا ،بۆيە دەبی ئيوە نەبن تەنها لە زيندانی وچەوساوەيی هەبن ، كەچی ئيسلامی كوردستان بەهۆی كاريگەری عەقليەتی موئامرەی عەقلی عربی ئاگايان لەوەی نەبوو كە ئەمريكا ئەو حيسابە مەزنەی بۆ كردبوون لە بەڵگەنامەی ئەمريكی بڕيارِی ژ:13 ـ 99ی سەرۆك كۆماری ئەمريكی لە1999/2/4بزوتنەوەی ئيسلامی لە سێيەمين حزبەكاريگەريەكانی(7حزبە كاريگەريانەی عێراق)ە: ويفاق ـ موئتەمەر ـ بزوتنەوە ـ پارتی ـ ملكی ـ يەكێتی ـ مجلس ئەعلا) نێو عێراق پۆلين كردبوو. تا دوايش بە هۆی ئەو عەقليەتە تووشی ليدان بوون .

10- لايەكی تريش باوەڕپێكردن بەو جۆرە زانياريانەی(وەك لە پرۆتۆكۆلات هاتوە-يان لەهەندیَ ڕاپۆرتی هەوالگری) ئەوا وادەكات هەموو جيهان خۆ بداتە دەست، تەنانەت دەڵێن زانيومانە و لە نەخشەی ئێمە بوە جەنگی جيهانيەكان، ئەگەر وابێت چۆن مسوڵمانان (يان ميللەتی فەلەستين) بەرگری دژی ئيسرائيل بكەن و.. دەبیَ خۆبدەنە دەست وەك خۆيان داوەتە دەست،تەنانەت ئەوجۆرە دەردە لەڕێی داگيركەرانەوە دەخرێتە نێو ميلەتی داگيركراو تا هێزی بەرگری لاواز بێت ،لە كوردستانيش ئەو دەردە هەبوەو هەيە ئيستاش،زۆر جار وا ليك دەدراوەو دەدريتەوە كە زۆربەی سەركردەكانی كورد دروست كراوی هەوالگرين وئەوانن پيلان جيبەجیَ دەكەن ، يان

جاروایە خودی شۆڕشەکانی کوردستان وا پۆلین دەکەن، وا جیهان پیشان دەدەن کە مسەیەرەو هەموی بە نەخشەو پلان وپیلان بڕیاڕی لەسەر دراوەو چارەی نیە ،ئەو گوتارە گەیشتۆتە ئاستی میلیش بۆیە کاریگەری سەلبیەکی زۆری هەیە لەسەر توانا خودیەکان .

7-زۆر جار ئەو گومانەو پیلان خراوەتە پال کەمایەتیەکانی وولاتانی عربی بوویتە هۆی ڕق وقینی پیچەوانە بێئەوەی بنچینەیەکی وای هەبیت، لەوانەش زیاتر ئەو توومەتەی پیلان دژی عرب دراوەتە پال کورد، گوایە بە فیتی زایۆنی وئیستعمارو ماسۆنی و مەجوسی و شیوعی و..زۆرلای ناکۆکیان بۆ کۆکردبۆوە ،جاروایە دۆستەکانی کوردیش کەوتۆتە ئەو داوە ،لەگەل هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول حزبی شیوعیش نەزەریەی موئامرەی بەکارهێناو ئەو شۆڕشەی بە پیلان وەسف دەکا، بەیانیکیشی دەرکرد لە 1961/8/22 ئەوە بەشەکەیتی (..في الفترة بين 20 - 23 تموز 1961، اجتمع السفير الأمريكي في إيران (هولمز) وبمساعدة الملحقين العسكريين الأمريكان وقنصل أمريكا في مدينة رضائية الإيرانية - بعد أن نظموا سفرات في المناطق الكردية من إيران واتصلوا ببعض الشيوخ والأغوات - وفي نفس الوقت قام رئيس الاستخبارات الإيرانية ببعض السفرات المريبة في المناطق الكردية من إيران. وكانت باكورة النشاط التآمري الأمريكي على الجمهورية العراقية إرسال علي حسين أغا المنكوري على رأس عصابة مسلحة بالأسلحة الأمريكية بإشراف مبعوثين أمريكيين والسلطات الإيرانية، وقد اجتاز الحدود العراقية ليفرض سيطرة عصابته المسلحة على ناحية ناودشت ويعتقل بعض موظفيها).

8-ئەو جۆرە نەزەریە وات لێدەکات گومان لە زانست وفلسفەو تکنۆلۆجیاش بکەیت ، بەو هۆیەوە دیمەنی سیاسەت بە ناشیرین دێتەبەرچاو،تاڕادەی شەرم بوون لەو پیشەیە، وشەی (سیاسەت) بەناوناتۆرە دەزانن و بەخێرایی ڕەتی دەکەنەوە ، ووتویانە (اعوذ بالله من الشيطان والسياسة) ، لە نێو کۆمەلگەی عیراقی زاراوەی(بلتيقى)بەکاردەهات وەك جوێن ،مانای(بلتيقە- پڵتیقە) بە

مانای(حیله باز) و(پیلانگێڕ) هاتوه،کە لەبنەچەدا لە پۆلیتیکی ئینگلیزی( سیاسە-Politico) هاتوە کە مانای سیاسەتە[1542].

لە کۆتاییدا ماوە ئەوە بڵێین هەزاران کەسایەتی وزاناونەفسی بێتاوان بەهۆی ئەو نەزەریە هەڵەیە لەناوبران ،چەندین براو کوڕو خزمی سولتان وخەلیفە بەو هۆیەوە لەناوبران ،جاروایە بەهۆی زانیاریەکی وا جینۆسایدکراوە .

---

[1542] المعجم الكامل للكلمات والمصطلحات العراقية المادة: بلتيقة

**(55)**

# كۆمەڵگە ی مەدەنی        المجتمع المدنی        civil society

ئەوانەش دەگریتەوە (مافەمەدەنیەکان، کۆمەلگەی کۆمیۆن ،کۆمەلگەی ئاینی ،کۆمەلگەی جیهانی ،توقیە، تطور خط مستقیم ، سارینس ، ئەنتی مەدەنی ، عهدتنظیمات،...)

بە تێکڕایی بەو کۆمەلگانە دەووترێ (کۆمەلگەی مەدەنی) کەلە وولاتێکدا تاکەکانی لەژێر کاریگەریە ماسولکەیی وخێلەکیەکان دەرچووبێت بۆ ژێر کاریگەری یاسایی وعەقلانی ، کۆی ئەو تاکانە کۆمەلگەیەك پێك دەهێنن کە کاریگەریە ستونیە کۆمەلایەتیەکانی میراتی وەرچەرخاوە بۆ کاریگەریە ئاسۆییە یاسایی وموکتەسەبەکان، دەووترێ یەکەم جار لە (روح القوانین- مونتیسکو)ی رەهەندی یاسایی بۆ کۆمەلگەی مەدەنی زیاد کراو بەکارهات بەو مانایە یاساییەی کەهەمو ی لەژێر کاریگەری یاسا بێت[1543]، بەوەش چەمکی هاوولاتی بوون دەبێتە بناغەی کۆمەلگەی مەدەنی ، هاوولاتی بوونیش بەستراوەتەوە بەمافێکی تر پێی دەلێن مافەمەدەنیەکان (Civil Rights) ئەو مافە گشتیە بۆ هەر هاولاتیەك لە هەر تیرەو رەگەزو ئاینێك بێت بێجیاوازی ،

واتە بەکەسێك یان کۆمەلگەیەك دەگوترێ مەدەنی کەخۆی لەکۆمەلگەی سارینسی وئەعرابی رزگارکردبێ ، خۆی لەئینتمایە کلاسیکیە ئاینی ورەگەزی وعەشایەری کۆنەکان رزگار کردبێ و بە پێی یاساو نەریتی مرۆیانە هەلس وکەوت بکا ، واتە کۆمەلگەی مەدەنی پەیوەندیەکی بەهێزی بە چەمکی شارستانی هەیە ،هەردوولایان لە کۆمەلگەیەکی شاری زیاتر مانای خۆی دەدا وەك لەمانای مەدەنی ئینگلیزی وفرنسی وئیتالی وادەدا ، مەرج نیە کۆمەلگەی مەدەنی وعەلمانی ودیموکراسی و سەرمایەداری و لیبرالی پێکوە بەسترابن ،کۆمەلگەی مەدەنی رێرەو و ماهیەتی تایبەتی خۆی هەیە بەلام ئەوانەش یارمەتیدەرینە ،لەهەمان کاتیش مەرجی هەرەگرنگ نین بۆی ، بەلام زاراوەی کۆمەلگەی مەدەنی ،مافەمەدەنیەکان،دەولەتی مەدەنی ،دادگای مەدەنی ،..تا دەگاتە هاوسەری مەدەنی لەگەلی هاتنە کایەوە .

---

[1543] توماس هوبز- اللفیاثان الاصول الطبیعة والسیاسة لسلطة الدولة ص241.

بەپیی (موسوعەی لالاند) لەسەدەی 16 ەوە زاراوەی مەدەنی بەکاردیت بەرامبەر کاری وگەلەکۆیی دڕندانە خیلەکیانەوڕەگەزیانە[1544]،بەلام پیش ئەوەش بەکارهاتوەهەر فارابی کتیبی هەیە بەناوی(علم المدنی- علم السعادە)، لە فرنسا بەوانە ووتراوە کە لەدەرەوەی دەسەلات کاری مەدەنی دەکەن ، هەرچی (هیگل)ە پیێی وایە هەمو ئەو تاکانەی کۆمەل بە یاساو پەیوەندیە ئابوریەکان دەبەستیتەوە کۆمەلگەی مەدەنین ..واتە پەیوەندیەکە خیلەکی وخوین ودەرەبەگی نیە ، واتە بیجگە لە سەردەمی سەرمایەداری ئەوانی تر کۆمەلگەی مەدەنی نین ، بە پیچەوانەی ئەوەش ویل دیورانت لە(قصة الحضارة) پیێی وایە هەمو چالاکی کۆنی بەشەری بە مەدەنی لێك دەداتەوە دەیەوێ بلێ لە دوای مرۆڤایەتی مەدەنیە ،ئەوەش نزیکە لە ڕاڤەی ئیبن خەلدوون پیێی وایە مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەدەنیە مادام نەتوانێ بەتەنها بژیو پیویستیان بە تێکڕایی هەیە ،مەگەر لەنگیەکی کۆمەلایەتی هەبێت , ئەوەی ڕوونە قورئانی پیرۆز بە ڕوونی باسی ئەعرابی کردوە کە لە یۆنانی کۆن بە سارینس گوزارش کراوە ،بەو شێوە ڕای جیاو پێناسی جیا بۆ کۆمەلگەی مەدەنی هاتوە .

پێناسەکانی:

+ پیناسە سیاسیەکانی: أنه المجتمع الّذي يقوم على المؤسّسات السياسية والاقتصادية والاجتماعية والثقافية التي تعمل في ميادينها المختلفة في استقلال نسبي عن سلطة الدولة " لتحقيق أغراض متعدِّدة.

+ پیناسە کۆمەلایەتیەکانی : مجموعة التنظيمات التطوّعيّة الحرّة التي تملا المجال العام بين الاسرة والدولة لتحقيق مصالح أفرادها ملتزمة في ذلك بقيم ومعايير الاحترام والتراضي والتسامح والادارة السّليمة للتنوّع الخلّاق.

[1544] موسوعە لالاندالفلسفيە ص241

+موسوعەی لالاند: جیاوازیەکی وای نەکردوە لەنیوان (شارستانی) و(مدنی) پێناسیشی واکردوون کە کۆمەلیك دیاردەی کۆمەلایەتی شایەنی گواستنەوەیە توخمی هاوبەشی ئاین وئەخلاق وهونەر وتەکنیکی کردۆتە بنچینە[1545] .

+ دیسان هەرلە(موسوعەی لالاند: لەسەدەی 16 سەری هەلداوە بریتین لەو شارستانی ومەدەنیانەی بەرامبەر بەربەری ودڕندەیی بەکارهیناوە[1546] وەك ئیبن خەلدوون .

+ الموسوعة العربية العالمية: مصطلح يعني، الحريات والحقوق التي يتمتع بها الفرد بصفته مواطنًا في مجتمع أو ولاية أو دولة. وتشمل هذه الحقوق حرية التعبير وحرية الصحافة والعقيدة وحرية التملك[1547].

+ الموسوعه الميسره : (مافی مەدەنی بریتیە لە یەکسانی وئازادی وحەوانەوەو .. فراوان ترە لە مافی سیاسی ومافی سروشتی کە بەهۆی ئەومافە هاوولاتی وولاتەکەی جیادەکاتەوە لە هاوولاتی بیانی[1548] .

+المعجم الحديث للتحليل السياسى: پیناسەکەی کردۆتە جیاوازی نێوان هاوولاتی بوون ... لەگەل دانیشتوان (سکان)[1549] .

+ موسوعە لالاند: کۆمەلگەی مەدەنی وەرچەرخانە لە کۆمەلگەیەکی سروشتی بۆ مەدەنی[1550] .

+هیگل:کۆمەلگەی مەدەنی مولکی دەولەتە .

+پیناسی ریکخراوە ناحکومیەکان(NGOS) بۆ کۆمەلگەی مەدەنی : هوحرية التشكيلات الذاتية والطوعية التي تهتم وترعى شئوناَ اقتصادية واجتماعية وثقافية وسياسية والذي يحتوي على مجموعة

---

[1545] موسوعةلالاندالفلسفية ص172.

[1546] ه س ص241

1547 الموسوعه العربيه العالميه –الماده: الحقوق المدنيه

[1548] الموسوعة الميسرة ص1394

[1549] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts -p66

[1550] موسوعو لالاند الفلسفيه ص171

من المؤسسات الاجتماعية مثل النقابات والمنظمات الأهلية التي تختلف في هيكلها التنظيمي وطبيعة نشاطها عن المؤسسات والأجهزة الحكومية فهي مؤسسات يشكلها ويديرها المواطنون وليس الدولة حتى وإن كانت تخضع للإشراف القانوني من قبل الدولة ولهذا السبب فإن هذه المنظمات تسمى منظمات غير حكومية وهي ما تعرف اختصارا بـ (NGOS)

+فەرهەنگی سیاسی : بریتیە لەو كۆمەلگەی كە لە هەندی مافی سروشتی خۆی خۆش دەبێ مل بۆ دەسەلات ویاساو دەولەت دادەنوێنی[1551] .

+ معجم القرن21 : وەسفی مەدەنی بە دژ بەبەربەری دەكا ئەوەش هەمان وەسفی شارستانیە[1552] .

لە ڕاستیدا كۆمەلگەی مەدەنی و شارستانی لێك جیان هەروەك هەندێك تێكەلیان كردوون،یان جمكیان كردوون ،بەلام پەیوەندیەكی بەهێزیان لەگەل یەكتر هەیە ،لەو سەردەمە شارستانی بوویتە مولكی هەمو بەشەریەت ،ناسنامەی نەماوە ،جوگرافیاو نیشتمان وئاین وفەرهەنگ لە شارستانی جیا بووینەوە ، خەریكە فەرهەنگیش ئەو ڕەوتە وەرگرێ، كەواتەشارستانی بریتیە لە كۆی داهێنانی مادی بەشەری لە یەكەم مرۆڤەوە تا ئەو ساتە ، هەرچی فەرهەنگە بریتیە لەداهێنانی فكری لەیەكەم مرۆڤەوە تا ئەو ساتە ، بەكارلیك كردنی هەردوو لا(شارستانی وسەقافە) شارستانی فراوانی هەمو بەشەریەتی لیدەردەچی ، بەكۆكردنەوەشیانی مەدەنیەتی لێدەردەچێ ، ئەوە مانای بە (كۆسمۆپۆلیتی كردن )نیە ،بەو مانایەی هاوولاتی جیهانی گەردوونی، باوەڕی بەحكومەتی جیهانی وكەلتورو ناسنامەی جیهانیە ، دژی كەلتورو ناسنامەی دەڤەری بێت .

سەرهەلدانی چەمكی كۆمەلگەی مەدەنی

وەك چەمك لە پیشتر سەری هەلداوە ئینجا بوە واقعی ، هەندێك پێیان وایە كتیبی(مقالتان فی الحكم المدنی-1690 )ی جۆن لۆك بەسەرەتای وەرچەرخانی دەسەلاتی نامەدەنی وەسف دەكریت ،ئەو

---

[1551] فەرهەنگی سیاسی ئارش ل529

[1552] معجم القرن21 ص179

کتیبە بە دوو ئارستە بوو دژی دیکتاتۆریەتی ئاینی وسیاسی بوو [1553] ، هەرچی (فەرهەنگی سیاسی ئارشی )ە دەڵێ لەسەدەی 18ەوە کەوتە سەر زار، یەکەم جار لە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) هاتە نێوسیاسەت ،لە بنەچەدا لە زاراوەی لیکدراوی لاتینی( koininia politike) هاتوەو ئەرستۆ بەکاری هیناوە بە مانای مەیلی سروشتی مرۆڤ بەرەو کۆمەڵایەتی وشاری ، ئەو دەڵێ کۆمەڵگەی شاری نەبیت کۆمەڵگەیەکی شپرزەیە[1554] ،سارینسیە ، بە پێی (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ) یەکەم جار ئەو ناوە لە نیوەی دوەمی سەدەی 16 لە فرنسا سەری هەڵدا لە زاراوەی لاتینی (societas civilis) هاتوە ، ئەوەش لە بنەچەدا لە زاراوەکەی ئەرستۆ (کۆمەڵگای سیاسی) هاتوە کە کۆمەڵیکی پیشکەوتوترن لەکۆمەڵگەی ئاسایی پیکهاتوو لە خیل ودەرەبەگ[1555] ، دەبێ ئاگاداربین هەڵەیەك هەیە لە تەرجەمەی عەرەبی بۆ هەریەکە لەrepoplic بۆ جمهوريه،politiic بۆ سیاسەت، ریپۆپلیك مانای (أشیاء عامة) دێ نەك جمهوری، ئەوەش دەقاودەق ماناو پێناسی سیاسەتە کە بریتیە لە پرسە گشتیەکان، پۆلیتیکیش مانای مەدەنیەتە، بۆیە راستیەکەی ئەوەیە ئەفلاتوونە باسی سیاسەتی کردووە نەك ئەرستۆ، ئەوەی ئەرستۆ باسی مەدەنیەتە ، بەشیکی دەڵێن ئەو چەمکە لەدوای شۆڕشی فرنسای 1789 سەری هەڵدا لە وەرگێڕانی (civil society) ،بەڵام ئەوە مانای کۆمەڵگەی مدنی نەبوو زیاتر مانای هاووڵاتی دەدا، هەرچی ( الموسوعە الميسره) دەڵێ یەکەم جار لە سالی 1840 سەری هەڵدا کاتی مارکس رەخنەی لە فلسفەی هیگل گرت لەبارەی یاسا، ،دەشلێ چەمکی هاووڵاتیش یەکەم جار جاك رۆسۆ بەکاری هیناوە ،بۆ دوو لا: 1- بەشداریەکی کاراڵە پرۆسەی حوکم 2-یەکسانیەکی تەواو[1556]، لە (الموسوعە السياسيه)ش هەمان ڕای هەیەو زۆربەی ئەو مادەیەی بە ڕاو ڕای پیچەوانەی نێوان مارکس وئەنجلس پڕکردۆتەوە . ..،تاڕادەیەك ڕۆڵی فەیلەسوف وزانایانی ئیسلامیان فەرامۆش کردوە کە باسی مەدەنیاتیان کردوە ،بەڵام بەگشتی وەك زاراوەو چەمك لە دەوروبەری سەدەی 17 لە ئەوروپا سەری هەڵدا کاتیك ئەو

---

[1553] بۆ زیاتر لەو کاریگەریە بروانە: معجم المؤلفات السياسيه ص906 .

[1554] فەرهەنگی سیاسی ئارشی فارسیە ل538- .

[1555] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية -د احمد سعيفان ص305 .

[1556] الموسوعة الميسرة للمصطلحات ص375 ص437

کۆمەلگەیە خنکا بوو لە ژێر ڕکیفی دەسەلاتی تاریکی حوکمی کنیسەو پادشاکانی هاوپەیمانیان ، سەروەری بۆ کۆمەلگە نەبوو ،دابەشی کۆمەلگە ستونی بوو لەسەر بنچینەی خیل وسەرۆك وململانییی ئاینی و رەگەزی ،لەو کاتە کۆمەلێك نوسەری بەهیزی وەك هۆبز (لەکتیبی لفیاثان)ورۆسۆ( لە کتیبی عقداجتماعی) جۆن لۆك (فی الحکم المـدنی )هەریەکە لە هیگل ونیتچە وستیۆرات مل و مارکس.. بانگیشەی کۆمەلگەیەکی مەدەنیان کرد دوور لەدەسەلاتی ئاینی ودەرەبەگی ، بەشێکی تر هەولەکانی(ناپلیۆن) بۆچەسپاندنی هاولاتی بوون ودەولەتی مەدەنی ، زانیویەتی پێویستی بەکۆمەلگەی مەدەنی هەیە ، وەك لەو کۆمەلە پرسیارانە دەردەکەوێ کە لە یەهودیەکان کرد سەبارەت بە هاولاتی بوون و(پرسی توقیە ) لە لایەك ، لەلایەکی ترخۆشەویستی وولاتی فرنسی وکۆکردنەوەی لەگەل ئەو بیرباوەڕانەی یەهودیان وەك (شعب الله المختار)وڕایان بەرامبەر میلەتی فرنساو تیکەل بوونیان ومولکیان و ژن وژنخوازی ...تا کۆمەلگەیەکی مەدەنی فرنسی دروست بکا[1557].

لە کۆمەلگەی کۆنەوە بۆ کۆمەلگەی مەدەنی

لە زۆر سەرچاوە باس لە مەدەنیەت وکۆمەلگەی مەدەنی لە چوارچێوەی تیۆری پەرەسەندنی کۆمەلگە لە خوارووە بۆسەروو دەکا، زۆربەشیان وای بۆچووینە کە کۆمەلگە لەدڕندەیی و هەمەجیەوە بەرەو مەدەنی هاتوون ،لە ڕێی چەند قۆناغێك کە هەریەکە بەجۆریك گوزارشی کردوە :

بەزۆری سێیان دیاری کردوە :قۆناغی سەرەتایی- ئامادەیی —وەزعی ،یان وەك ئۆکست کۆنت دەلێت: سەرەتا قۆناغی ئاینی بوو دوای فەلسەفە ئینجا زانست ،لەلای مۆرگان بە : دڕندایەتی — بەربەری —مەدەنیەت[1558] .

مارکسیەت: دڕندایەتی-بەندایەتی- دەرەبەگی- سەرمایەداری- سۆشیالیستی زانستی- شیوعیەت .

---

[1557] احمد داوداوغلو — العمق الستراتیجی (موقع ترکیا ودورها فی الساحة الدولیة )ص411

[1558] الدکتور إحسان محمد الحسن -موسوعە علم الاجتماع ص255

-فریزەر: جادوو- ئایین- زانست

ابن خلدون: بداوە- خێڵەکی- دەوڵەت.

- میتافیزیکی- زانست ...[1559]

- جۆن لۆك دەلێ عەقل (نەك ئیمان) ڕێپیشاندەری ئەوەل وئاخیرمان بێت [1560].

لەگەل زۆر ڕای تر،کە هەریەکەیان ڕیشەیەکیان دەچیتەوە سەر مدرسە فلسفی وزانستیەکان ، ئەوانەی پێیان وایە سەرهەلّدانی کۆمەلّگە لەگەشەی مەیمون بۆ مرۆڤ دەست پێدەکات،ئەوانە زیاتر (مەدرەسەی مادیەکان)ی پێدەووتریت، ئەو کاتەزۆر ئاساییە کۆمەلّگەی سەرەتایی دڕندەیی بێت، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش مورگان، مارکس و.. پێیان وایە کۆمەلّگەی سەرەتایی دڕندە و گۆشت خۆر و ڕاوچی بوە ، گەورە بیرمەندی کورد(عبدالله ئۆجەلان)پێی وایە وەرچەرخانی مرۆڤ لە ئاژەلە شیردەرەکان بۆ مرۆڤی عاقل(هۆمۆساپیناس) 7ملیۆن سالی خایاندوە[1561] ،ئەوجۆرە بۆچوونە بەگشتی پێی دەوتریت( تطور خط مستقیم— پەرەسەندنی ڕێك ) ، ئەوەش پاساوی هەرسێ یاسای فلسفی دیالیکتیکە بەتایبەتی یاسای (نەفی ئەلنەفی). لەراستیدا زانایانی (پەرەسەندنی- تطوری ) کۆمەلایەتی وەك ( لوپۆك . پاخوفن — مالکینان — باستیان — جیر — والکیز ..)، بەتایبەتی (مۆرگان) لەکتێبی (المجتمع القدیم- system of eans angaimty and aftarniy) هەمان بۆچونیان هەبوو ،چونکە سەردەمی ئەو بۆچونانە گونجاو وباوی تیۆری پەرە سەندن بوە،کە لەلایەن (داروین 1809-1881 ن ) پیشتریش لەلایەن (لامارك ) داڕێژرا بوو پەڕێنرایەوە بۆ خودی مرۆڤیش، لەو تیۆرەدا کۆمەل لە رەچەلەکدا لەو ئادەمیزادانە هاتوون کە باپیرانیان گۆریلاوئاژەل بووە ، بیرۆکەی نەبوونی رژێم و خێزان و میری و یاسا و خزمایەتی و ئاینی ...وباقی دیاردە نامەدەنیەکان لەوە

---

[1559] بۆ زیاتر لەو ڕووەوە بڕوانە : 1- ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان ل3 2- مارکسیة قرن عشرین ص144-

[1560] موسوعة المشاهیرالعالم فی العلوم والفکروالسیاسة ج1 ص52 .

[1561] عبداللة ئۆجلان — مانیفیستو الحضارة الدیمقراطیة ج1ص86

هاتوە،ئەوەی هەبوە لە درەنگانێکی گەشەی کۆمەلگە سیستەمی خێلەکی و بنەمالەیی وباقی فاکتەرە ستونی کۆمەلایەتیەکان خەملی .

باری کۆمەڵی کۆن لە سەرەتادا لە باشترین دۆخیدابەو شێوەیە بووە (لەڕووی هۆکارە دەرەکیەکان):

1- فرە خوایی وفرە ئاینی و..

2- کاری سروشت لەسەر کۆمەڵ زیاتر بووە لە ئێستا.

3- پێویستی تاك و خێزان بە بنەماڵە و خێڵ بۆ پارێزگاری لە دوژمن و کارەساتە سروشتیەکان و فاکتەر دەرەکیەکان زیاتر بووە.

4- ئاسۆی فکری کۆمەڵایەتی تەسك بووە، چونکە هەرزنجیرە دیاردەیەکی سروشتی و کۆمەڵایەتی دووبارەبۆوەی بەمیراتی فکری بۆ دەماوە.

5- ئەندازەیەك لە قەدەغەو (حرام و حلال)ی هەبوو بەپێی کۆمەڵە ڕێسایەکی ئەخلاقی ئەو ئاینانە,

5. هێزی ماسولکە (یەکلاکەرەوە) تر بووە لە هێزی (عەقڵ).

ئەو وەسفانە کۆمەلگەیەکی پەرتەوازەو خیلەکی ودوور لەمەدەنیەت دیزاین دەکات ، هەرتاکەو یان کۆمەلە بەشەریەك بە سروشت خەریکن نەك بە پەیوەندیە ئاسۆییەکان ودەزگای دەولەت وڕێکخستن ،لەو قۆناغە وەسفی هەرە (ئەنتی مەدەنی) کۆمەلگەی ساراسێنس، (Saracens)یە،یان بەزاراوەی قورئان ئەعرابە ،سارینس لە ووشەی Σαρακηνός یۆنانیەوە وەرگیراوە،ڕۆمەکان بەکاریان دەهێنا بۆهەندێ ئەعرابی رۆمی دانیشتووی بیابانی خۆیان،مانای خیوەتی بەخشیوە[1562]، دواتر ووشەکە بۆ عەرەبەکان بەکاردەهێنرا،واتە هەمو عەرەب کرا ئەعرابی وبەدەوی کە بە واتای دانیشتوی خێوەت ، بۆ ئەو کەسانەی بیابانین و کۆچەرین کەسانێك کە توندرە و دلڕەقن، دوورن لەژیانی مەدەنی، لە ڕاستیدا ئەو وەسفە هەر بۆعەرەب نیە ،دەتوانین بلێین قۆناغێکی پیش مەدەنیەتی گرتۆتەوە،

[1562] هەندێکیش دەلێن لەبنەڕەتا ئەو ووشەیە لە (شرقیون)سوڕدراوە بوویتە سەرکینیۆس

بەشێکی زۆر پێیان وایە مەدەنیەت وشار پێکەوە گەشەی کردوە ، کوردۆن چایلدلەوانی ترزیاتر ئەو ڕایەی هەیە، دەلیت میژووی شار ناوەڕۆکی میژووی شارستانیە[1563]،لە (طبقات الامم)واعاتوە کە لەسەردەمی سوکراتەوە گرنگی بە فەلسەفەی مەدەنیی دراوە لە جیاتی فلسفەی سروشتی)[1564]،دوای گۆڕان وگەشەسەندنی کۆمەڵ دەستی پێکردو قۆناغەکانی دەرەبەگیشی بڕی وگەیشتە ئاستێك پێی نایە مەدەنیەت،لەدوای کۆنگرەی ویستیڤالیا وەرچەرخانی زۆر گەورەهاتە کایەوە ، مەدەنی ونامەدەنی ،دیکتاتۆری ودیموکراسی ،زانست ونەفامی،ناشیۆنالیزمی وئومەمی ..پیکەوە سەرهەلدەدا،لایەسەلبیەکان بەرەو کۆتایی ولایەنە ئیجابیەکە بەرەو گەشە ، ئەو زاراوانەی وەك دیکتاتۆری وساتۆکراسی دەولەت لەدوای سەدەی 17 سەرهەلدەدا ،هەروەك کۆمەلگەی مەدەنیش لەوکاتی بەتەریبی لەگەل ئەوان سەرهەلدەدا ، (قاموس المصطلحات السیاسیة )دەلێ دەسەلاتی ڕەها لە سەدەی 16 سەری هەلداو لەسەدەی 17 بەرجەستە بووو لەدژی دەرەبەگایەتی تا گەیشتە رادەی ئەوەی دەسەلاتی ڕەها پاساوی خوای هینایەوە ووتیان مولك بۆ دەرەبەگ نیە بەلکو هەموی بۆ خوایەو ووتیان شاو مەلیك تەنها بەرپرسن بەرامبەر خودا نەك خیلە دەرەبەگیەکان ...[1565] ، لێرەوە لویسی شازدە ووتی دەولەت منم ومنیش دەولەت، کەچی هەر هەنگاوی ئیجابیە بەرەو مەدەنی مادام لە ژێرخانی کۆمەلگەش گۆڕان بەرێ دەکەوێ ، ئەوەیان هەنگاوێك بۆ لیسەندنەوەی دەسەلات لە کۆمەلگەی خیلەکی ودەرەبەگی و وەرچەرخانی بۆ کۆمەلگەی مەدەنی ، لەگەل ئەوەش ساتۆکراسی(بەمانای هەمو چالاکیەك بۆ دەولەت) بەردەوام بوو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئەوروپا ، ووتارەکەی مۆسۆلینی لە28ئۆکتۆبەر1926 میلانۆ ووتی نابی هیچ چالاکیەك بەدەرلەدەولەت بکرێت[1566] ، واتە چالاکی مەدەنی قەدەغەیە، سەرەڕای ئەوانەش دەگەینە قۆناغێکی گەشەی کۆمەلگە ی تەواو جیا لەو وەسفانەی سەروو کە لە دەروازەکانی هۆکارە دەرەکیەکانی کۆمەلگە کرا، ئێستا لەڕووی هۆکاری ناوەکی بەو شێوەیە:

---

[1563] دارین تۆمسن –مشکلات السکان ص171-172 .

[1564] قاضی ابی القاسم بن صاعد الاندلسی- طبقات الامم ص23.

[1565] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة ص164

[1566] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة -د احمد سعیفان ص201

1- سەرهەلدانی ئاینی یەکتا پەرستی .

2- کەمتر ئیعتماد لەسەر رەوتی سروشت،و پەیدابوونی کارکەری ناوەکی وەك (پێشەسازی و کارخانە و دەزگا و...) پەیوەندی جارانی کۆمەڵ لەگەڵ سروشت راستەوخۆ بوو، بەڵام ئێستا ئەو پەیوەندیە بەهۆی ئامێر و ئامرازە، لە ئەنجامدا زیاتر کۆنترۆڵی سروشت کراوە،ئەوەش مانای سیفەتی بوونی مرۆڤ بە(خلیفە) لەسەر زەوی ،لەگەڵ زیاد بوونی ئامراز زیاتر کۆنترۆلی سروشت دەکا ،ئەوەش پیویستی بە دام ودەزگای دەولەت وپەیوەندی وهاوولاتی بوون وسیستەم ومەدەنیەت دەکا،ڕێك ئەوسنورە بریتیە لە مەوداومەدای شارستانی مرۆڤ .

بەو شیوەیە ئەوانە پێیان وادەبی کە کۆمەلگەی مەدەنی داهینراوی سیستەمی عەقلانی وسەردەم وسەرمایەداریە ،ئەوانەی دژ بەو تیۆرانەن و پێیان وایە کۆمەلگەی سەرەتایش خاوەن پەیام و سیستەم ودادگەری بوە ئەوا پیێی وایە کۆمەلگەی مەدەنی تازە نیەو ڕیشەکانی بە جۆرێك لە جۆرەکان دەچێتەوە سەر ئاین ، وەك لەبڕگەکانی تر زیاتر دەردەکەوێ، لەو نێوانە (ویل دیورانت) لە (قصة الحضارة) ڕای خۆی هەیەو پێی وایە هەمو چالاکی کۆنی بەشەری مەدەنی بوە ،دەیەوێ بلی لە دوای مرۆڤایەتی مەدەنیە ، دەشلێ(کیف أصبح إنسان الغابة أو إنسان الکهف هو المعماري المصري، أو الفلکي البابلي، أو النبي العبري، أو الحاکم الفارسيّ، أو الشاعر الیوناني، أو المهندس الروماني، أو القدیس الهندي، أو الفنان الیاباني، أو الحکیم الصیني" لا بد لنا أن نسلك سبیلنا من علم الأجناس البشریة- عن طریق علم الآثار- لننتهي إلی التاریخ) ، دەشلی ئەسلی مەدەنیەت لە میزۆپۆتامیا( کوردستان)بوە ، ئەوە یەك دەگریتەوە لەگەل قورئان وسەربردەی (ح نوح) لە جودی ، تارادەیەك هۆبز پشتیوانی ئەو بۆچوونە دەکات و دەلێت سیاسەت ومەدەنیەت لە مەملەکەتی خواش هەیە ، وەك دەقی تەرجەمەی عربی دەلێ(السیاسة والقوانین المدنیة فی مملکة اللة جزءا من الدین) ،لە شوینیکی تر دەلێت یاساکانی مەدەنیش لە ئاین هەیە نەك دژ بەیەك نین ، یاساکانی رۆما بە مەدەنی لەقەلەمداوە[1567] .

1567 توماس هوبز- اللفیاثان الاصول الطبیعة والسیاسة لسلطة الدولة ص126 و ص267.

بۆ ئەوەی ڕوون تر لە کۆمەلگەی مەدەنی بگەین پیویستمان بە ڕوون کردنەوەی گەشەو دیاری کردنی ئینتماوکاریگەریەکانە بەسەر تاك وکۆمەلگە

## وەرچەرخانی ئینتما–کۆمەلگەی مەدەنی

هاتنەدی کۆمەڵگەی مەدەنی پرۆسەیەکی میژووییە بریتیە لەوەرچەرخانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەژێرکاریگەریە کۆمەلایەتیەکان بۆکاریگەری یاسایی، یان جاروایە مانایەکی وەختی تریش وەردەگریٚ بریتیە لەوەرچەرخان لەکاریگەری فاکتەرە ستونیەکان بۆفاکتەرە ئاسۆییەکان، کەواتە فاکتەری ئاسۆیی وستونی مانایان چیە؟

کاریگەری ئاسۆیی وستونی هەیە لە هەمان کات ئینتمای ئاسۆیی وستونیش هەیە، کاریگەریەکانی سەر مرۆڤ بە دوو ئاڕستەیە، یەکیان لە ڕێی میراتی وپشتاو پشت ئەوەی دوەمیش لەریٚی وەرگرتن وپەیدا کردنی عەقلیە ، هەر لەسەر ئەو بنچینەش مرۆڤ زۆر جۆرە ئینتمای جیاجیای ستونی و ئاسۆیی، وەرگیراو و میراتی، ..بۆ دروست دەبیٚ، ، ئینتمای ستونی بریتیە لە ئینتمایەکان بۆ: خیٚزان، بنەماڵە، تیرە، خیٚلٚ، نەتەوە..،هەندیٚ لە ناشیۆنالیزمیەکان (نەتەوایەتی) لیٚ دەپەڕێنن بەتایبەتی (ناشیۆنالیزمی عەرەبی لەو سەردەمە)[تی هتر]، ئەوەش هەر ستونیە، هەمو ئەو جۆرە ئینتمایانە دەگرێتەوە کەبەدەرە لە خواستی مرۆڤ، میراتیە، خوێنە، بایۆلۆجیایە، ..کەسەرخانەکانی بریتین لە : بنەمالەیی، خیٚلەکی، میرات، ڕچەلەك، جوگرافیا، بایلوجی، نەژادی، ڕەش و سپی، نیٚرو میٚ، ...تادەگاتەکیشوەربازی وەك ئەوروپچیایەتی..، بوونی مرۆڤ لەو ڕەگەزانە سەربەست نیە، بۆیەش لە دەستورو بەلگەنامەو باقی ریکخراوە مەدەنی وحقوقیەکان واهاتون کە ئەو ڕەگەزانە گرنگ نین ،جیاوازی مرۆڤ لەسەر ئەو بنچینانە ناکریٚ ،ئەوە زیاتر مافەکانی مەدەنی دیاری دەکا.

ئەو ئینتمایانەی باسمان کرد کارتێکەر دروست دەکات ، هەموو ئەو کارتێکەرانەی لە ڕیٚ ی میرات و خوێن و خزمایەتی و بنەماڵە و خیٚلایەتی ونەتەوایەتی دەکەوێتە سەر تاك بە فاکتەری ستونی

---

[تی هتر] الموسوعة السياسة.ع.غ.ف.ق،ج4 ص180.

ناوزەدکراون، هەرچی ئەو فاکتەرانەی لەرِێ ی عەقڵی وەردەگیرێ وەك بوون لەمەدرەسە و فکر و ئایدۆلۆژیا و حیزب و ئایین ورِیکخراو... ئەوانە فاکتەری ئاسۆیین.

ئەوەی یەکەم(ستونیەکان) بەدەرە لەخواست و ویستی خۆی، ئینتیمای نەژادی (نێر یان مێ) بنەماڵەیی و خێڵەکی و نەتەوەیت بۆ دیاریدەکات، ناکەوێتە سەرچالاکی عەقلی و کەسایەتی، بەداخەوە ئەوانە بووینە ناسنامەی مرۆڤ لەکاتێکا ناسنامەی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەو بەشە دیاری ناکرێت بەلکو لەدوەما دیاری دەکرێت ، مەبەست لەدوەما (ئاسۆییەکان)ە- وەرگیراوە، لەژێر ڕکێفی ئیرادەیە، خۆت لێ ی بەرپرسیاری، لە ئاینی ڕاستەقینە یان مەدرەسەیەکی بە مەبادیئی ئەوە دەبێتە ناسنامەی مرۆڤ، ئینتیما بۆ حیزب و ئایین و ئایدۆلۆژیات بۆ دیاریدەکات، لە کۆمەڵگەی ئاسۆیی ناسنامە لەسەر بنچینەی فاکتەرە ئاسۆییەکان دیاردەکرێت، هەر ئەوەش مرۆڤانەترە،سزا و پاداشتی دوارۆژیش لەسەر فاکتەرە ستونیەکان نیە، بەڵکو لەو پانتاییەیە کە فاکتەرە ئاسۆییەکان لێ ی دەجولێن ودۆمەینی پێك دەهێنن، جیهانی نوێ بەرەو ئەو ئاراستەیە کە مرۆڤ بەهۆی فاکتەرە ستونی و پایەی کۆمەڵایەتی و ناسنامە سزا و پاداشت وەرنەگرێ، کۆمەلێك ریکەوتنامە وبڕیاری نیودەولەتی بۆ دەرچوە ،بۆئەوەی تەرازوەکان بکەوێتە سەر فاکتەرە ئاسۆییەکان، کۆمەڵگەی مەدەنی یەکێکە لەبەرهەمەکانی فاکتەرە ئاسۆییەکان، وردتر لەکۆمەڵگەی سەرەتایی زیاتر فاکتەرە ستونیەکان زاڵ بووە، بەرە بەرە لەگەڵ گەشەی کۆمەڵگە هەم فاکتەرە دەرەکیەکان لاوازدەبن هەم فاکتەرە ستونیەکانیش لاوازدەبن لەبەردەم فاکتەرە ئاسۆیی و ناوەکی، کەواتە دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی لە قۆناغەکانی درەنگی گەشەی کۆمەڵگە ئاسانترە، لەسەرەتا نیمچە ئەستەم و مەحاڵە بەهۆی ئینتمای خەستی مرۆڤ بۆ فاکتەرە ستونیەکان، یان بەلای کەمی بەپێ ی گەشەی سروشتی کۆمەڵگە لەمیژووی قوول کۆمەڵگەی مەدەنی دروست نابێت، ئەگەر هەبووبێت ئەوە پەیام بوە تیایدا پایەی سیاسی و یاسایی و فکری و ئایینی و ئیداری جیاکرایتەوە لە پایەی کۆمەڵایەتی، ،ئەو هەرەمە مرۆڤایەتیەی پێك دەهات جیابوو لەو هەرەمە کۆمەلایەتیەکە.

کەواتە فاکتەرە ستونیەکان بریتین لەو فاکتەرانەی کە بوونت تیایدا لە دەستە خۆت نیە ،بەدەرە لە ئیرادەو ئارەزووت،..، بوونێکی خۆڕسکە ئەرك وخەبات ورِێکخستنی ناوێ ،هەرچی

دوومه(ئاسۆییەکان) پیویستی پێیەتی لەهەموشیان گرنگ تر پێویستی بە یاسا هەیە تا ئەو پرۆسەیەی رێك بخات،کەواتە بە دیوێکی تر دەتوانین بلێین کۆمەلگەی مەدەنی یان تاکی مەدەنی یان هەر مەدەنی بەگشتی ئەوەیە کەتاك لە ژێر کاریگەری کۆمەلایەتی وەرچەرخێ بۆ ژێر کاریگەری یاسا ، لەپالّ دام ودەزگای یاسایی هەریەکە لە سیاسی و زانستی و شارستانیش...دەگرێتەوە.

سەلبیاتیشی : بۆزۆربەی چەمکەکانی سەردەم هەولدراوە ڕیشەیەکی لە یۆنانی کۆن بدۆزرێتەوە ،با سەلبیاتی کۆمەلگەی مەدەنی لە کۆمەلگەی یۆنانی کۆن دەست پێبکەین ،لە کۆی 300000 هاوولاتی لە ئەسیناو دەوروبەری تەنها30000کەس مافی بەشداری بڕیارو هاوولاتی بوونی ڕاستەقینەبوە،ئەوانە بەمەدەنی هەژمارکراون ,ئەوانی تر بە کۆیلەو مرۆڤی ناقس هەژمارکراون ،بریتی بووینە لە(کۆیلەو بیانی وئافرەت )ئەو جۆرە حوکمە پیچەوانی دیموکراسی بوە کە بە حوکمی میلی ناوزەد دەکریت بەلکو ئەوە حوکمی (ئۆتۆکراسیە)[1569].

مەرج نیە کۆمەلگەی مەدەنی هەمو دیوەکانی ئیجابی بێت ، ئەو وەرچەرخانە(لە کۆمەلگەی کلاسیکیەوە بۆ کۆمەلگەی مەدەنی) سادەو ئاسان نیە بەچەند دروشمێك بێتەدی، ئینجا گۆبەندێکە سەرەنجامی فرە ڕووە لە سەلبی وئیجابی بەتایبەتی بۆمیللەتانێك لە قۆناغی گواستنەوەی سەختدایە( وەك کورد کە لە قۆناغی رزگاری نیشتیمانیە) پێویستی بەپەیوەندی کۆمەلآیەتی بەهێز هەیە، چونکە شۆڕش و ڕاپەڕین وکوردایەتی وهاریکاری و...لەفەرهەنگی کۆمەلّگەی مەدەنی دەگمەنە، بەتایبەتی بەو شێوازە رێبازەی علمانی کوردستان گرتویانەبەر ،گوایەکۆمەلّگەی مەدەنی وەك ئەوروپا لەرێگەی گەشەی مادی وسەرمایەوبازاڕی ئازاد دەهێننەدی، هەلّبەتە ئەو شێوەیە کۆمەلّگەی کوردی بەناسنامەوە تەرت و وێران دەکا هەروەك وا وێرانی کردووەودەکا، چونکە کۆمەلّگەی کوردی لەڕەگ و ڕیشەوە زۆر جیایە لەگەلّ ئەوروپا، بۆیە هەربنەمایەکی کۆمەلّگەی کوردی هەلّدەتەکێ بنەمایەکی وێران کەری بەرژەوەندی خۆویستی تاکانەی دێتەجێ ی، ئینجا یاسا

---

[1569] قانون الشعوب ص88

بەتاقی تەنها کۆمەڵگەی وای بیٚ کۆنترۆڵ ناکریٚ، بەتایبەتی ئەو جۆرە یاسا لەنگانەی هەرێمی کوردستان، کەتائێستاش یاسایەکی نەفامیە،بەهێز فیتۆی هەیە وهەژاریش پێوەبوە، بەئەزمون سەلمێنراوە وادەشبینین بەمەدەنی کردنی کۆمەڵگەی کوردی لەرێی شارستانی بوون و پەیوەست کردنی بەژیانی مادی سەرمایەداریەوە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی ئینتیمای ڕەسەنی کوردایەتی، چالاك ترین نمونە ئەودیاردە نامۆیەی وەرچەرخانی ئینتیمای نەتەوەیی کورد بەرەو زمانی تورکمانی لەهەولێر .،. ئێستاش بەمەدەنی کردن بەبیٚ کۆنترۆڵی عەقیدەیی ئەوا ئینتیمایەکانی سەلامەت نابیٚ، لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ئینتیما کلاسیکیەکانی یەك سەرکێش دەبیٚ بۆبازنەیەکی دەرەوەی ڕەسەنی کوردایەتی ، لەکۆمەڵگەی وادا گۆڕینی کۆمەڵگەیەکی کلاسیکی بەرەو مەدەنیەت مەرج نیە بەرێی ئەوروپیانەو لەرێی بەها لیبرالی و سەرمایەداری و مادیەکان ئەنجام بدریٚ، دەکریٚ بەهۆی ئایدۆلوژیاو ئایین و دەزگازانستیەکانی وەك زانکۆ سەنتەرو رێکخراو حزبە خاوەن بنەماکانیش بێتە دی، کۆمەڵگەی مەدەنی ستاندەر بەند نیە تەنها بەباروو دۆخی ئابووری و تەکنەلۆجیا و زەمەن و زەمین ...، ئەکتیڤ کردنی ئینتیما ئاسۆییەکان و زاڵ کردنی بەسەر ئینتیما ستونیەکان چاکترین دەروازەیە بۆ ئەو وەرچەرخانە، لەڕاستیدا ئەو تەقەلایانەی کراون بۆ بەرپا کردنی کۆمەلگەی مەدەنی لەکوردستان بەهۆی ئەو ئامرازانەی (لەسەروو باسمان کرد) پیچەوانە بوویتەوەو(ئەنتی مەدەنی) هێناوەتە بەرهەم ،بریتیە لە وەرچەرخانی کۆمەڵگەی کوردی بەرەو کۆمەڵگەیەکی عەوام، جاران زیاتر مەدەنی تر بووینە نەك ئیستای سەردەمی تکنۆلۆژیای پیش کەوتوو، هەر بەکورتی با سەرنج بدەینەتوخمەکانی مەدەنیەت لە کۆمەلگەی کوردەواری: لە سەردەمی میرنشینەکان بە پێی شەریعەتی ئیسلامی هاوولاتی بوون لێیان ماوەی *15* ڕۆژ بوو، پێکەوە ژیانی ئاینەکان لە کۆمەلگەی کوردەواری بەناوبانگە لە فەرهەنگە جهانیەکان تەنانەت لیژنەی نێو بژی ویلایەتی موسل ئەو دۆخەی بە دەگمەن وەسف کردووە، کاهینێکی گەڕیدە هاتبوە کوردستان سەرسام بو بەوتەباییەی نێوان کوردستانیەکان لە ئاینە جیاجیاکان کتێبێکی نوسیبوو بەناوی(مهد البشریە ـ الحیاه فی شرق کوردستان)،تیایدا شیخ عبدالسلامی بە(برایان بۆرۆ)ی ئیرلەندای شوبهاندبوو، بە شیخ النصرانی بەناوبانگ بو، مالی مەسیحی زیاتر پارێزراوبوە[ببىلهتر]،

---

[1570]ـ أیوب بارزانی –المقاومة الكردیة للإحتلال ص8 هەروەها بڕوانە ئـەو ڕووداوەی یارمـەتی ئەرمەنـەکان لەلایـەن سـەرکردە ئاینیەکانی کورد لە ل264ی مسعود بارزانی-بارزانی وبزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد

،دۆخی ئافرەتی کوردیش بالا بوە لە گەڕیدە دەرەکیەکانیش ئەو ڕاستیە بەرجەستە بوە ،(کلۆدیس ریچ)دەلیٚ ئافرەتی کورد لە چاو ئافرەتانی تورك وعەرەب و ئیٚرانیش زۆر باشتر بوەو جۆرە یەکسانی وسەربەخۆیی ودەسەلاٚتیان هەبوە[1571]، هەروەها لەبەلگەنامەکانی بریتانیش وا هاتوە: (... الكرد غير متعصبين...يعطي الكرد اكثر من العرب الحقوق النساء ...حتى في المجالس الخاصة كانت النساء يرأسن الاجتماعات ولنا )[1572] ،خاوەن مولکی تایبەتی خۆیان بووینە بەناوی (شکارەت)[1573]لە بادینی ولەسۆرانی بەناوی شکارتە ، ئینجا هەمووتاکیٚك بەرپرسیەتی و پاسەوانی سامانی گشتی لە ئەستۆ بوو بۆیە بیٚ ئەوەی پۆلیس هەبیٚ مال و سامانی خەلکی لەو گۆڕە بوو پاراستراویش بوو، وەك ئیستا دەسەلات چڕ نەکرابۆوە بۆ کەم خەلکیٚکی ناشایستە وهەموو کاریٚك هەر حکومەت بیکا، تەنانەت لەو سەردەمی خویٚندنیش مەدەنی بوو لەشارو لادیٚکان لە سەر زەکات و خیٚری خەلکی بەڕیٚوە دەچوو، تەنانەت پاریزگاری ژینگەش لە ئیستا گەشە سەندووتر بوو بیٚ ئەوەی وەزارەتیشی هەبیٚ، هەموو خەلکی خۆی لە پیس کردنی ئاوو، سووتاندن، ڕاوی ئاژەل لەساتی زاووزیٚ،چاندنی دارو دروخت ...هەموو ئەوانە بەشیٚك بووە لەباوەڕی ئاینی (النظافة من الإيمان ) لەگەل زۆر باسی تر کە لیٚرە مەودا نیە باسی بکەین .

<u>**کۆمەلگەی مەدەنی و شۆڕش:**</u> بەگشتی گۆڕانکاری بەدوو شیٚوە دیٚتە دی، یەکەمیان بەلەسەرەخۆیی وتەدریجی وچەندایەتی،لەدوەمیشیان بە توندی وناکاوو چۆنایەتی ، ئەوە لەسەر ئاستی بوونەوەر ،هەرچی بۆ کۆمەلگەیە ئەوا دیسان گۆڕان بە گشتی لە کۆمەلگەی مەدەنی جیایە لە کۆمەلگەیەکی ستونی عەشایەری، ڕیٚسایەکی گرنگ هەیە فەرمان لەسەر پەیوەندی نیٚوان گۆڕانی توندو گۆڕانی هیٚواش دەکا ،ئەویش ئەوەیە: تا تیٚکڕای کاریگەری عەقلانی زال تر بیٚت بەسەر کۆمەلگە لە جیاتی کاریگەری هیٚزی ماسولکە ئەوا گۆڕانەکان مەودای زیاتری هیٚواش وەردەگرن، پیٚچەوانەشی بە

---

[1571] کلودیس-رحلة فى العراق سنة1880ص104

[1572]*CO 730/ 161/2--1931 \ اذار \14*

[1573] بۆ ئەسلی زاراوەی شکارەت بروانە :عادات ورسوماتی اکرادیە —وەرگیربۆ روسی: روو دینگۆ ،لە روسیەوە بۆکوردی :د شکریە رسول ل78

پێچەوانە،کەواتە لایەك لە مانای گەشەی کۆمەڵگە ئەوەیە کە گۆڕانە توندەکان کەم دەبنەوە ،کەواتە لە قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵگە شۆڕش وڕاپەڕین ومەرج نیە بەشێوەی کلاسیکی بمێنێ ، شۆڕشی مەدەنی جێی دەگرێتەوە ،کە مەرج نیە پێویستی بە یاخی بوون وچەکداری وشۆڕشی سوور بێت.

کەواتە شۆرش بە هەموڕەهەندەکانیەوە لەکۆمەڵگەیەکی مەدەنی زۆرجیایە لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی خێلەکی، ،بە زۆری لە کۆمەڵگەی عەشایەری مانای چاکسازیو گۆڕانی عەقلانی کەم ترە ،زیاتر بەشیوەو ئامرازی توندو تیژیە ،خوێناویە، یان هەر گۆڕانکاری وچوونە پیش دەوەستێ ،ئەگەر چی شۆڕش ئامرازێکی ڕەوای میلەتانی چەوساوەیە بەلام بە کۆی گشتی گوزارشە لە کۆمەڵگەیەکی ستونی ، چارەنووسی شۆرش لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی یاخودئاینی ستاندەر بەتەواوی دەگۆڕێ ، ڕۆلی ئامرازی شۆرش لە کۆمەڵگەی مەدەنی زۆر کەم دەبێتەوە، وەبگرە پێویست نامێنێ مەگەربۆگۆرینی سیستەم نەك بۆ گۆرینی دەسەلات، بەلام لەکۆمەڵگەیەکی دادگەر بەیەکجاری کاری شۆرش دەوەستێ وئامرازی رەخنەی بیناکەرو ئۆپۆزیسۆنی ئامۆژگاری کەروخەباتی مەدەنی...جێی دەگرێتەوە ، واتە بەرەبەرە لەگەل گەشەی کۆمەڵگە وعەقلانیەت گۆڕانەکان کەم تر شێوازی شۆڕش وەردەگرێ ،یان هەر بەگشتی لە کاری بەدەستە جەمعی لە کۆمەڵگەی مەدەنی کەم دەبیتەوە ،لە جیاتی دام ودەزگای حکومی ومەدەنی جێی دەگریتەوە ، لەوەش مانایەك بۆ شۆرش نامینیتەوە لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی وتیایدا دەست گۆری دەسەلات ودیموکراسی وسەروەری یاسا..، ئەگەر زۆر پیویست بێت لە شیوەی مانگرتن وخۆپیشاندانی هاوپیشەیی دەبێت ،کەم تر ئەو جۆرە کۆمەڵگەیە گیانی ودادگەری بۆ گشتی وئایدیۆلۆجیای مرۆڤایەتی دەبێتە ئامانجی یەکەمی ،لەوەوە کۆمەڵگەی مەدەنی لەکۆمەڵگەی ئاینی ڕاستەقینە جیا دەکرێتەوە .

لە تەوەریکی تریشەوە گۆڕانکاری مەدەنی جێی گۆڕانکاری توندو شۆڕشگێڕانە دەگرێتەوە ،وەك لەسەروو دیاری کرا لایەك لەمانای مەدەنی مانای شاری بوونە،مانای وەرچەرخانی کاری گوندەکیە بۆ کاری شاری ،کاری ماسولکەیی بۆ کاری عەقلیش، یان بە واتایەکی تر کاری کشت وکالی بۆ تەکنیکی ،لە یەکەما گۆڕانکاریەکانی کۆمەلایەتی زیاتر بە توندوتیژی وشۆڕش دەکرێ لەدوەما بە خەباتی مەدەنی وئاشتی وعەقلانی دەکرێ ،هەردوولاش لە قۆناغی خۆی شەرعیەتی هەیە .

هەڵبەتە گۆڕان لە دژی (وەستاو) بەشێکە لە (مقاصد الانسانیە) و (تەعمیر)، بۆیە گۆڕان و چاکسازی هێمن چارەسەری دائیمە، رەسەن ترە، چاك تر ئامانج دەپێکێ.. بەڵام تا رادەی خۆی ئینجا دەپەڕێتەوە بۆ شۆڕش، واتە تا پلەیەکی زۆر جۆری گۆڕان (واتە شۆڕشە یان چاکسازی) ئەکەویتە سەر سروشتی لایەنی بەرامبەر، بەشێکی کەمیش ئەوەستێتە سەر هەڵ و مەرجی (لایەنی یەکەم واتە چەوساوە و ماف خوراوەکان)، ئاخۆ چیان پێ دەکرێ؟ لە توانایان دا هەیە.. ئەگەر شۆڕشیان پێ نەکرێ ئەرك نیە، هەر فەرموودەی (من رأى منكم منكرا...هتد) ئەوە سنورەکانی چاکسازی و شۆڕشە.

لەسەر ئەو بنچینەیە شۆرشی رزگاری زیاتر لەلادێ سەرهەلدەدا، جاران کەریژەی دانیشتوانی شار لە جهان لەنیوان (5- 7)٪ بوو ریژەی ئەو شۆرشانە زیاتر بوو، دوای رابوونی پیشەسازی ریژەی دانیشتوانی شارەکان زیادی کرد بۆ 25٪ وئیستاش نیوە بە نیوەیە، بۆیە بزوتنەوەی شۆرشگێری کەم بوویتەوە، تەنها لە توانای مدرەسەکانی خاوەن ئایدیۆلۆژی ماوە، هەروەك بینیمان لە شۆرشی ئیران لەنێو کۆمەلگەیەکی مەدەنی کرا بە هۆی ڤاکتەری ئاینی، ئیستا زیاتر لایەنە ئاینیەکانە شۆرشی رزگاری پێ دەکرێ ئەگەر پیویست بوو ،بەلایەکی تر دەتوانین بلێین کۆمەلگەی مەدەنی کەمتر دەتوانێ بە شۆڕش هەلسێ ،توانای ئەو زیاتر خەباتی مەدەنیە ،بۆیە هەردەم دەولەتی مەدەنی پێویستە ،رابەرو پیاوی دەولەتی مەدەنی پیویستە ،جاروایە (سروشتی مرۆڤ) بەرەو دیکتاتۆریەت دەچێ هەردەم شۆڕش لە پلەی پیویست دەمێنێ ،کەواتە کۆمەلگەی مەدەنی پیشکەوتنە بەلام کۆمەلگەیەکی تەواو ستاندەر نیە .

## جیاوازی کۆمەلگەی مەدەنی وکۆمەلگەی ئاینی

لەو هەمو توێژینەوەی سەرووخەریکە وەسفێکی تر بدەینە کۆمەلگەی مەدەنی و بلێین لە پیشەی کشت وکاڵ دەردەچێ کە لە ژێر کاریگەری سروشتە بۆ پیشەیەك کە لەژێر کاریگەری دەولەتە، بۆیە بەشێك (لەوانە هیگل )پێ ی وایە کۆمەڵگەی سەرمایەداری و برجوازی دەگرێتەوە و تایبەتە بە مەدرەسەی لیبراڵ دیموکراتی، هیگل باسی کۆمەلگەی مەدەنی وەك پرۆسەیەکی پاریزراو دەکا

،مەترسی هەمیشەیی لەسەرە بۆیە دەولەتی پیویستە[1574] هەرچی مارکسە پیچەوانەی ئەوەیەو دەلیٚ کۆمەلگەو دەولەت لیٚکجیایە. بەشیٚکی تر پیٚ ی وایە کۆمەڵگەی ئایینی ڕاستەقینەیە، بەشیٚکی تر پیٚیان وایە دروست بونی کۆمەڵگەی مەدەنی بەندە بەگەشەی کۆمەڵگە، دەتوانین بلٚیین کۆمەلگەی مەدەنی لەگەل سیستەمی عەلمانیەت ولیبرال دیموکراسی وسەرمایەداری وسروشتی برجوازی لیٚك نزیکە،بە هەمان شیٚوە لە شارستانی وفەرهەنگ وکەلتورو جۆری حکومەت وئاینی کلاسیکیش نزیکە ، بۆیە بە زەحمەت کۆمەلگەی تری وەك شیوعیەت یان ئاینی لەژیٚر ئەو فەزایە دەخولقیٚ ،هەریەکەو فەزاو لۆجیکیٚکی تایبەتی خۆی هەیە ،کۆمەلیٚك یاوەرو هاوپیچی خۆی هەیە،ڕەهەندە دەولیەکانیشی لیٚك جیایە ، دام ودەزگای جهانی جیاش دەخولقیٚنیٚ ، وەك چۆن دەزگاکانی کۆمەلگەی مەدەنی نیوان دەولەت وکۆمەلگەن کۆمەلگەی مەدەنی جیهانی ئەو ریکخراو دەزگایانەی لەسەر ئاستی جیهانی کاردەکا (وەك مافی مرۆڤ)سەربە دەسەلاتە جیهانیەکانیش نیە ،بە تیٚکڕایی خەریکە بلٚیین هەرکیشوەروناوچەیەك جۆرە کۆمەلگەیەکی بەرهەم هیناوە ،بۆ ئەوروپا کۆمەلگەی مەدەنی ،بۆ ئەوانەی لەسەر ڕاڕەوی ئەوروپیش دەڕۆن ، یان بەدیویکی تر جهانی یەکەم ودوەم وجیهانی سیٚیەم وچوارەم ..کۆمەلگەی جیهانی یەکەم ودوەم وسیٚیەم و ..دەخولقیٚنیٚ ولیٚکتریش جیان ،کۆمەلگەی مەدەنی جیهانی یەکەم بەرامبەر کۆمەلگەی جیهانی سیٚیەم زۆر پیشکەوتو ترە .

بەو جۆرە فرە تیٚڕوانینی مەدرەسەکان دیزاینی فرە کۆمەلگە دروست دەکات ، لەسەر ئەو بنچینە کۆمەلگەی شیوعی وکۆمەلگەی لیبرالی وکۆمەلگەی ئاینی وکۆمەلگەی کۆمیۆنی و..تادەگاتە کۆمەلگەی عەشایری (پیچەوانەی کۆمەلگەی مەدەنی) هەبوەو ئاسەواری ماوە ، واتە کۆمەلگەی مەدەنی کۆتایی گۆڕانکاریەکانی کۆمەلایەتی نیە ئەگەرچی لە ئیستادا ئەویان لەهەموان زیاتر باوی هەیە،قۆناغە،کۆمەلگەی شیوعی لەو بالاٚ ترە، کۆمەلگەی کۆمیۆنیش بەهەمان شیٚوە ،کۆمیۆنی ئەوانەن جیا لە کۆمەلگەی مەدەنی کە بەرژەوەندی گشتی دەخەنە سەرووی شەخسی کەلە کۆمەلگەی مەدەنی تاڕادەیەکی زۆر پیچەوانەیە ،کۆمەلگەی ئاینیش بالاٚترە ،بەلام هەمویان (جگە لەکۆمەلگەی

---

[1574] هيغل – فلسفة الحق ص8 .

خێلەکی) پێویستیان بە قۆناغی کۆمەڵگەی مەدەنیە ، بەلایەکی تر کۆمەلگەی ئاینی توخمی کۆمەلگەی مەدەنی تێایە،بەلام یەکسان نین وەك هەندی لە بیریارانی ئیسلامی پاگندەی کۆمەلگەی ئیسلامی بە ویچووی کۆمەلگەی مەدەنی دەکەن ، ڕاستیەکەی وەك بۆچوونەکەی هیگل کۆمەلگەی مەدەنیش پرۆسەو دروست کردنە ، وەرچەرخانی فاکتەرە ستونیەکانە بۆ ئاسۆییەکان ،..ئەوانەش هەمو پێویستن بۆ کۆمەلگەی ئاینی ،کۆمەلگەی ئاینیش(امە) پرۆسەو دروست کردنە وەك لەقورئان هاتوە (لتکن منکم امە).

هەندێ جار پیناسە ئەکادیمیەکانی مەدەنی لە ئاین نزیك دەبنەوە ،ئەگەر مەدەنی وکۆمەلگەی مەدەنی بەو مافە تایبەتی وئازادیانە ووترابێت کە هاوولاتی ئەو وولاتە هەیبوە ،هەر نوقستانیك بەهۆی رەگەزی ونەژادی وئاینی وچینایەتی و..نوقستانیە لە هاوولاتی بوون ، ئەگەر هەر ئەوەندە بێت، ئەوەلەبارە خراپەکانی کۆمەلگەی ئیسلامی هەبوە،،لە سالی 1864 یاسایەکی تایبەتیش بۆ یەهودی بەناوی (نیزام حاخامخانە)دەرچوو بۆ هەردوو ئەنجومەنی (روحانی وجسمانی)یەهودی تیایدا لە مادەکانی (3 و7) دیاری کرا کە شوینی حاخام لە ئەستەمبۆلی پایتەخت دەبێت [1575]، لەمادەی لە مەشروتیەی عوسمانی(دەستور) دیسان ئەو یەکسانیە لە بابی( في حقوق تبعة الدولة العثمانية العمومية)لەمادەی (8)ەوە تا مادەی(26) دەگرێتەوە - المادة الثامنة : (يطلق اسم عثماني بدون استثناء على كافة أفراد التبعة العثمانية، من أي دين ومذهب كانوا، وهذه الصفة العثمانية تفقد أو تستحصل على مقتضي الأحوال المعينة قانونيا) ، لە بارەی ئاینیش - المادة الحادية عشرة :(إنّ دين الدولة العثمانية هو دين الإسلام. مع المحافظة على هذا الأساس، تكون حرية جميع الأديان المعروفة في الممالك العثمانية وكافة الامتيازات الممنوحة إلى الجماعات المختلفة، تحت حماية الدولة، على شرط أن لا تخل براحة الخلق ولا بالآداب العمومية)[1576]، لەفەرمانی عوسمانی کەلەهەردووخەتی همایۆنی گولخانەو دەرچوەلەلایەن سولتان عبدالمجیدمۆرکراوە لە 1856/2/18 بۆیەکسانی و هاوولاتی مسیحی وموسولمان وکەمایەتی بۆ سەدری ئەعزەم نێردراوە ،دەقەکەی:(كما أن مساواة

[1575] سعد سلوم – السياسات والاثنيات فى العراق (منذ الحكم العثمانى حتى الوقت الراهن) ص20-

[1576] القانون الاساسي العثمانى –پیکهاتبوو لە 129مادە لە 1876/12/24 دەرچوە .

الخراج تستوجب مساواة سائر التكاليف والمساواة في الحقوق تستدعى المساواة في الوظائف، فالمسيحيون وسائر التبعة غير المسلمة يسحبون نمرة قرعة مثل المسلمين، ويجبرون على الانقياد للقرار الصادر أخيرًا، وتجري عليهم أحكام المعافاة من الخدمة العسكرية بتقديم البدل الشخصي أو النقدي)،دواى ناونرا(عهدتنظيمات)، له دەقى ئاینى وهەمو ئەوانەی پشتیان بەو دەقە بەستوە مافی هاوولاتی بوون لە ئاین زیاتر بوە ،کۆمەلگەیەکیشیان دروست کردوە لەسەرووی کۆمەلگەی مەدەنی، لەهەمان کات ئەگەر بشگەرێینەوە هەندێ بەشی فقهی کەسەرچاوەکەی لەژێر دەسەلاتی ئەمەوی و دەسەلاتانی تری عەقلیەتی ئەعرابی وئۆتۆکراسی ئاینی هاتوە ئەوە هاوولاتی پلەیەك ودوو وسێ ..هەبوە (ئەوەیە ناومان لێناوە ئاینی کلاسیکی کە هەلەشە)لەو بارەیەوە ئیبن قەیم دەلێ: (فإنَّ قياس الكافر على المسلِم من أفسد القياس..." فإن الذِّميَّ يُستحق عليه القصاص، ولا يَستحقُّه هو على المسلم، ويُستحَقُّ عليه حدُّ القذف ولا يستحقه، وكذلك المُطلِّق في مرَض الموت يُستحق عليه الميراثُ ولا يستحقه، وكذلك المسلِم يَستحق تعليةَ البنيان على الذِّمي ولا يَستحقه الذميُّ عليه، والمسلم يستحقُّ نِكاح الكافرة وشراء الرَّقيق الكافر، ولا يستحق الذمي نكاح المسلمة ولا شراء الرقيق المسلم، والمسلم يستأجر الكافر للخِدمة دُون العكس...)[1577].تەنانەت لە نێوان یەك ئاینیش جیاوازی هەبوە لەسەردەمی ئەمەوی نابوایە عەرەب وموالی(واتە غەیرە عرب)یەکسان بوونایە با هەردوولاش موسولمان بوونایە لە زۆرلای فقهی تر هاوسەری لەنیوان عرب وغەیرە عرب حرام بوە .

کەواتە کۆمەلگەی ئاینی وکۆمەلگەی (ئاینی کلاسیکی)یش لیکجیایە ،ئەوەی یەکەم ئینتمایەکی ئاسۆییەو دوەم دەچێتەوە ئینتما ستونیەکان ،کۆمەلگەی ئاینی هەروەك لە کۆمەلگەی مەدەنی جیا بوو ئاواش لە کۆمەلگەی سیۆکراتی جیایە ،لە کۆمەلگەی شیوعیش جیایە ، کۆمەلگەی ئاینی ئومەیە ، کەواتە جیاوازیەکانی ئومەو کۆمەلگەی مەدەنی سەرچاوەی جیاوازیەکانن ،کە بەکورتی باسیکیان دەکەین :

لەپیشدا دەبێ ئەوە ڕوون کەینەوە کەمەبەست لەکۆمەلگەی ئاینی وکۆمەلگەی ئیسلامی یەکە ، کۆمەلگە ئاینیە ڕاستەقینەکانی مەسیحی ویەهودی وزەردەشتی وتاوی و..یەك جەوهەری هەیە ،بۆیە

[1577] ابن القيِّم - أحكام أهل الذمة ج1ص596 - 597

جاروایە تاقانە کردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی (ئومەتی محمد) بەهەڵەداچونیکی تیدایە ،وەك انور جندی دەڵیت کۆمەڵگەی ئیسلامی بەتەنها توانیویەتی هاوسەنگی نێوان تاك وکۆ بهێنیتەدی[1578] ڕاستە بەلام کەدەڵیٚ هیچ کۆمەڵگەی تر پیٚی نەکراوە هەڵوەستەی دەویٚ.

کۆمەڵگەی ئیسلامی(امە) کار بە (امربالمعروف ونهی عن المنکر)دەکات ،هەر ئەوەندە نیە بە چاك بلیٚ چاك وبە خراپیش بلیٚ خراپ، بەلکو فەرمان بە چاکە دەکاو گەشەی پیٚدەدا ،کاریش بۆ وەستانی خراپە دەکا بە پیٚی (اذارای منکم منکرا...) لەکاتێکا کۆمەڵگەی مەدەنی ئەو ئەرکەی نیە ،ئەگەر هەیبیت زیاتر لەشیوەی ئۆپۆزیسۆنە بەتەواوی مانای ئۆپۆزیسۆنی دیموکراسی سەردەم .

ئومە لە پرۆسەی (امربالمعروف ونهی عن المنکر)خولیای گەیشتنە دەسەلاتن ، کۆمەڵگەی مەدەنی ئەوەی ناویٚ دەیەویٚ دەسەلات بەرەو ناوەندی ساتۆکراسی نەڕوا .

لە ئومە ئایدیۆلۆجی و چەمکە ئەخلاقیەکانی بە هانا هاتن وویژدان وهاریکاری و بەزەیی ..هەیە بۆ هەموان،لە کۆمەڵگەی مەدەنی ئەو جۆرە کارانە بە ئەرکی حکومەت یان ریکخراویکی مەدەنی دەزانی نەك ئەرکی گشتی .

لە ئومە بەرژەوەندی گشتی زالە بەسەر بەرژەوەندی تایبەت ،لە کۆمەڵگەی مەدەنی پیچەوانەیەو شەرعیەتیشی دراوەتیٚ .

ئومە وکۆمەڵگەی ئاینی بە دوای دادگەریە،دوا ئامانجیانە، کەچی کۆمەڵگەی مەدەنی ناگاتە ئاستی لیٚپیچانەوە لەو چەمکە ،وانازانیٚ ئەرکی ئەوە .

ئومە بۆ هەمو سەردەمیك دەکریٚ دروستی بکەی وزیندووی بکەیەوە کەچی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ قۆناغیکی تایبەتی گەشەی کۆمەڵگەیە .

کۆمەڵگەی مەدەنی لە ڕێی گەشەی تکنۆلۆجی وسەرمایەو سروشتی برجوازی دروست دەبێت ،تیایدا لایەنە چاکەکانی هەندیٚ فاکتەرو ئینتمای ستونی لاواز دەکا،پەیوەندیە کۆمەلایەتیە ئیجابیەکانیش تەسك دەکاتەوە ،کەچی ئومە بە هۆی ئایدیۆلۆجیا دروست دەبێت پیویستی بە تیکدانی هەمو فاکتەروئینتمایە ستونیەکان نیە ،بەتایبەتی لایەنە چاکەکانی پاریزگاری لیدەکات .

---

[1578] انورجندی-المعلمە الاسلامیە ج1ص617-618 .

بەو شێوەیە کۆمەلگەی مەدەنی وکۆمەلگەی ئاینی(ئومە)لێکجیان ،بەلام بۆ وەرچەرخانی کۆمەلگە بەرەو ئومە پێویستی بەو قۆناغە هەیە ،واتە دەبێ بەکۆمەلگەی مەدەنی تێپەڕی .

کەواتە: کۆمەلگەی مەدەنی کۆتایی گەشەی کۆمەلگە نیە ،بۆ ئەو جۆرە کۆمەلگەیە باشە کە بناغەکانی (نەریت وفەرهەنگ وئاین وداب و..) تێکشیواوە یان تەواو ستونیە ،لەو کاتانە واچاکە کۆمەلگەیەکی مەدەنی وادروست بکەی کە لەجیاتی ستونیایەتی و هەرتاکەو لەخۆی بەرپرس بیت ولەژێر کاریگەری ئەو فاکتەرانە وەریچەرخینی بۆ کاریگەری یاسا ، کۆمەلگەی ئیسلامی هەم ئاسۆییە وهەم لە سەلبیاتی ئەو جۆرە کاریگەریانە رزگار دەبیت بیئەوەی بناغە کۆمەلایەتیەکەی لە هاریکاری وتەبایی و دەستباری وبەرپرسیاریەتی وو هەلوەشینیەوە .

لەگەل کۆمەلگەی شیوعیەتیش جیادەبێت، ئەوکاتە هاوولاتی بوون بۆ پیکهاتەی بچووك ئەوەیە لەکەمایەتی و ناسنامەیەکی خواپیداو دەیتوێنیەوە بۆ نێو چینایەتی ، هەرچی ئیسلامە هەم هاوولاتی بوونی هەیە هەم پاریزگاری لە پیکهاتەکەش وناسنامە نیشانەخواییەکەشی دەکا وەك لە (دەستوری مەدینە) هاتوە .

(56)

## عەبەسی العبثية Absurdity

ئەوانەش دەگرێتەوە (ڕۆتین ، تراجیدیا،سیریالی، دادی،هەرەمی ماسلۆ، سلم الترتيب، هاوسەنگی سروشتی، فلسفەی گومان،ئەنارکی، vonite ..)

لەو سەردەمە زیاتر بە بۆچوونی وجودیەکان دەووترێ عەبەسی، ئەو کاتەی ئەلبیرکامۆ لە کیرکیجارد جیادەبیتەوە تویژینەوەیەك بلاو دەکاتەوە بەناوی (اسطورة سيزيف 1942) بوە سەرهەلدانی عەبەسی ،ئەو بۆچوونانەیان لە چوارچێوەی بزوتنەوەی شانۆگەری بێمانا دەرکەوت کە بە عربی بە (لامعقول)ناوزەد دەکرێت بە ئیینگلیزی بە (Absurd) هەندێکی تر بە (Nonsense) بەمانای بێتامو هەندێکی بە (Unconscious) بەبێئەقلی ، وادەگۆترێ یەکەم جار ناوی عەبەسی بۆ ئەو جۆرە بزوتنەوەیە دیاری کردوە .

بەلام لە بنەچەداعەبەسی چەمکێکی زۆر فراوانە زۆربەی مەیدانەکانی ژیان دەگریتەوە ،لە زانست وفلسفەو ئاین ویاساوسیاسەت وهونەروفەرهەنگ و..،دوو جار لە قورئان هاتوەو پینج جاریش لە ئینجیل عەبەسی بەتوندی ڕەت دەکەنەوە ، بەهەموو کارێکی بێ ئامانج دەوترێ عەبەسی، بەشێوەیەك لایەنگرانی عەبەسی پێیان وایە ئەو گەردوونە بەبێ ئامانج دروست بووە،ریکەوت وسودفە ڕۆلی هاتنە بوونیان بینیوە نەك نەخشەو پلان وئامانج، کۆمەڵگە و مرۆڤیش بەهەمان شێوە ،بڕوای بە لێپێچینەوەی دوارۆژ نیە ، لەوەوە بەتەواوی لەگەڵ ئایین تێك دەگیرێن ، دەلێن لێیان گەرێن با لێپێچینەوەی نەبێ لەوەوە لەگەڵ یاساش تیکدەگیرێن، دەشلێن ژیان مانای نیە لەوەش لەگەڵ سیستەم و یاسا و دەوڵەتتداری و باقی فەلسەفەکانی تریش تێك دەگیرێن، هەربۆیەش ڕیشەیەکی قوولی لە نێو ئەدەبیاتی بەشەری هەیە ،زیاترگوزارش بوە لە چیرۆك وشانۆگەری وشیعر ،

بەناوبانگترینیان سەربردەی (مأساة)[1579] کەلەئەدەبیاتی ئەوروپا سەردەمی ئەگریگ تا شکسپیرو وجودیە نوێیەکان بەدی دەکرێت ، یان بە زاراوەی (تراجیدیا :Tragedy)گوزارش کراوە ،لە بنەچەدا تراجیدیا بە سەربردەیەك ووتراوە کە کۆتاییەکەی بە مردن ورۆژانی ڕەش دێت،ئەو جۆرە تراجیدیایە لە ئەفسانە کۆنەکانی ئەگریك وەرگیراوە ، گێڕانەوەی خۆشی وناخۆشی زۆری تێدایە ئەو کتیبانەی ئەو باسەیان کردوە بریتین لە(ئاشلی —سۆفۆکلیس- ئیرپیدیس ..).

لەو سەردەمە زیاتر فەلسەفەی وجودی نوێنەرایەتی ئەو بۆچونە دەکات، گوایە لە ئەنجامی پێچەوانە بوونی پەیوەندی نێوان ئامرازو مرۆڤ هاتە کایەوە ،لەدژی ئەوەی کە مرۆڤ لە خزمەتی کەرستەو ئامرازبێت لەکاتیکا لە بنچینەدا ئامراز لە خزمەتی مرۆڤە،بەلام فلسفەی عەبەسی لە چوارچێوەی ئەو پاساوە نەما ، لەنێو وجودیەکان سەرەتا لە شێوەی ئەدەبی و هونەری خۆیان گوزارشت کرد، زۆربەی شانۆگەریەکانیان بە تراجیدیا و بێ ماناو بێئامانج کۆتایی دەهات، ئەو تەیارە فەلسەفی و عەقیدیە هەر لە تەیاری وجودی قەتیس نەماوە، بە کەمێك قوولبوونەوە دەبینین ڕەهەندی عەبەسی لە تەواوی کارو تێڕوانین وبەرنامەکانی مرۆڤ بەدی دەکرێ ، ئەو بەشەی کە عەبەسی بەرهەمی دەهێنێ زیاتر ڕۆتینی پێدەووترێت، لەناو ڕەوشەنبیر وبیریاروفەیلەسوفان بە سەلبی ناوزەد دەکرا بەلام لەو سەردەمە فیزیای کوانتەم وبیروڕاکانی ستیڤن هۆکینگ جاریکی تر بنچینەیەکی زانستی بۆ ئەو چەمکە دروست کردەوە ،لەبارەی پیناسیشی لەلایەن خۆیان ولایەنەکانی بەرامبەر لێکجیان ،هەندیکی هەلدەبژێرین .

## پیناسەکان:

+ معجم المعاني الجامع: الفلسفة والتصوُّف ) فلسفة العبث في وجود البشر في الكون ، مَنْ يُؤمن بأنّ الكفاح الإنسانيّ لا طائل تحته .

---

[1579] بۆ بابەتی پرسی (المأساه)بڕوانە : موسوعة المصطلح النقدی —ت:عبدالواحد لؤلؤلؤة ج1ص33- بەدواوە ).

+ پیناسی ئیجابی بۆی ئەوەیە ناکۆکیەکە لە نێوان ویستی مرۆڤ بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی و کەمی توانای هێنانەدیەکی .

+ Encyclopædia Britannica Article : ئەو پیناسیکی لۆجیکی کردوەو دەلێت: بە هەموو ئەو کردارانە دەووترێ عەبەسی کە سەرەنجامەکەی ناکۆك دێتەوە لەگەل دەستپێکی ،بە ئەنجامی (پووچ-تافە-trivial ) وەسف کردوە .

+موسوعة المذاهب الفكرية المعاصرة: العبثية مدرسة أدبية فكرية، تدعي أن الإنسان ضائع لم يعد لسلوكه معنى في الحياة المعاصرة، ولم يعد لأفكاره مضمون وإنما هو يجتر أفكاره لأنه فقد القدرة على رؤية الأشياء بحجمها الطبيعي[1580].

+موسوعه لالاند : عەبەسی بریتیە لە بیروبۆچوونو گوتاریکی بێمانا ...لە(ج3ص1527 ) فرنسیەکەی بە(vonite) تۆمارکردوە لەوێ بەمانای (بێنرخ) و بێبنەما[1581]،

+ موسوعة كوم- الكترونية: هي مدرسة أدبية فكرية لا تقيد نفسها بكثير من القيم الإنسانية، ولا ترى أن هناك أي مضمون حقيقي وراء السلوك الإنساني، الذي تحلل في المجتمع الغربي بسبب سيطرة الآلة على مسارات الحياة حتى إنها جعلت الإنسان ترساً في هذه الآلة الضخمة .

+ئایۆنسکۆ :کۆمەلگەی عەبەسی ئەو کۆمەلگەیە کە هیچ ئامانجێکی نیە ،دابڕاوە لەڕیشەو مێژوو وئاین وفەرهەنگی خۆی تیایدا تاك وون دەبێت .

+معجم الفلسفی: پێناسێکی فلسفی کردوەو دەلێ(ارتكاب أمر غير معلوم الفائدة) واتە کارێك کە قازانجەکەی دیار نەبێت .

__بۆچونی عەبەسیەکان__

---

[1580] بیجگە لەو مەوسوعەیە چەندین مەوسوعە وسەرچاوەی تر ڕێك ئەو پیناسەیان تۆمارکردوە .

[1581] موسوعە لالاندالفلسفیە ص15

ناوی کۆمەلیك زانا دێت وەك عەبەسی لەوانە :هەردوو زانایانی فرنسی(سامۆیل پاکیت،ئۆجن پۆنسکۆ،سارتەر) ئینجا ئەلبیر کامۆو کیرکیجاردبەجۆرێکی تر ..هەروەها (فرۆید، باکۆنینی بوو، باکۆنین ، کرۆبۆتکین ، برۆدۆن ، کیرکیجارد)جاروایە بە عەبەسی لە قەلەم دەدرێن .

کۆمەلیك ڕایان کورت دەکەینەوە لەبارەی گەردوون وژیان وکۆمەلگە دژ بە ئاین،بەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە:

لە هەموان گرنگ تر نارِەزاییەکەی (فرانك کلۆز) لەبارەی کاری نابەجێی خوای (عەبەسی لەکاری خودا) ئەو ووتی : ئەگەر مەبەستی خودا لەو بوونەوەرە تەنها مرۆڤە چ پێویستی دەکرد ئەو گەردونە گەورەیە دروست بکا، هەر کۆمەلەی خۆر بەس بوو ، ئیتر باسی لەوە کرد ئەو بوونەوەرە پڕیەتی لە ئەستێرەو نیازك وکەشکەشانی بێئیش وکارو زیادە دروستکراوە، یان ئەوەتا خوا نەیزانیە بە دانایی کارەکەی بکا، یان ئەوەتا ئەوبیرۆکەی کە گوایە خوا جیهانی دروست کردوە ڕاست نیە ، ئەو بۆچوونە ئاینپەروەرانی جیهانی مەسیحی ویەهودی وموسولمانی دلتەنگ کرد کە وەلامەکەی زۆر زەحمەت بوو لەو سەردەمی لە ژێر سایەی نەبوونی زانستی (هاوسەنگی سروشتی) ،بوە هۆی سەرهەلدانی زیاتری فلسفەی مادی وتیۆرە زانستیەکانی تری وەك تیۆری پەرەسەندن، زەمینە یەکی بەهێزیشە بۆ یاسای داروینی (هەلبژاردنی سروشتی)،..

بە هەمان ماناو ئارِستە ئەو پرسیارە لەسەر زەویش دەکرا دەیان ووت چ سودیك لە دروست کردنی بەکتریاو ماسی ودڕندە هەیە؟ مادام مارو دوپشك دەبێ بکوژرێن ئەدی بۆ دروست کراون؟ ئەو هەمو دارودرەختە بیسوودە چیە دروست بوە، ئەوەش ووتراوە لە یەك کاری جنسی ملیۆنان خانەی جنسی لای نێر بۆ مێیەکە دەچێت کەچی یەك خانە پیویستە ،..

ئینجا کۆمەلناسەکان دەیان ووت ئەو هەمو شەڕو کارەساتە بۆ؟ لە کۆنەوە (ئەبیکور) دەیووت ئەو هەمو کارەسات وشەڕە یان ئەوەیە کاری خوایە کە خراپە یان خوا توانای نیەچارەی بکا مادام بۆ بیپەرستم ، بەهەمان شێوە هیۆم 6گومانی گەلالە کرد لە کتیبی(محاورات فی الدین تاطبیعی) لە گومانی ژ:2ی (دیڤید هیۆم) باس لەوە دەکاو دەلێ ئەگەر کاری خودا عەبەسی نیەو داناییە

ئەو هەمو كارەساتە سروشتیە چیە ، ئەو هەمو ڕووداوە بیسەروبەرو بێئامانجە لە گڕكان ولافاوو كارەساتی سروشتی وشەڕو چ سودێكی هەیە ..لەگەل زۆر بۆچوونی تر ویستراوە ئاینپەروەران بخەنە بەردەم دوو ئەگەری تاڵ، لەكۆتایدا دوو مانای دەدا یان ئەوەتا كاری خودا بەدانایانەو ئامانجدار نیە ، پڕیەتی لەلایەنی عەبەسی وزیادەو بێكارو بێمانا ، ئەوە كاری خودا نیەو بۆچوونەكەیان دەبوە ڕاست كە دەیان ووت ئەو بوونەوەرە عەبەسیانەو بێمەبەست بە ڕێكەوت وسودفە دروست بوە .

لەسەر ئاستی فلسفەش زۆربەی جار ئەگەر منهج ولۆجیكێكی ستاندەری نەبووبێ كەوتۆتە فەزای عەبەسی ،لەهەموان نزیك تر سەفسەتایی ومیسالی زاتی ، لەلای بەشەكانی تریش (هیگل — ئەنجلس- شۆبنهاور..)باسیان لەناكۆكی سەرتاسەری كراوە باسیان لە(بوون ونەبوون لەیەك كاتدا)كردوە، لە جووڵەیەو وەستاوە، هەیەونیە، ئامادەیەو غائبە، مادەیەو نامادەیە.. لەوەوە فەلسەفەی گومان وراڕەوی دیالكتیك و بنەمای فەلسەفی(ناكۆكی —التناقض) سەری هەلدا، بە عەبەسیانە سەری لەهەموان تیكداوە ، فەیلەسوف وزانایەكی وەك دیكارت لەوەوە كاتێكی زۆری خۆی بۆ ئەوەی تەرخان كرد تا گەیشتە ئەو دلنیاییەی كەخۆی هەیە مادام بیر دەكاتەوە، هەندێ جاریش وەردەچەرخا بۆ میسالی زاتی ونكولی لە بوونەوەر دەكرا تەنها دەیان ووت ئەو بوونەوەرە لەمێشكمان هەیە، لەهەموان ووردتر (هیگل) بۆ ئەو بابەتانە ڕووچووبو، پێی وابوو هەموو شتێك هەیە لەهەمان كاتدا نیە ، هیچ شتیك بوونی ڕەهای نیە، ئەوەشتە لەهەمان كات شتیكی ترە، شوبنهاور وەك هیگل وئەنجلس ئەو باوەڕە فەلسەفیەی هەبوو، لەووەوە باوەڕیان بە رژێم وسیستەم ویاسا نەبوە ،باوەڕیان بە كۆت وپلان نەبوە ، باوەڕیان بە ئەنارشیزمی هەبوە بۆ كۆمەلگەو مرۆڤیش ، تیكدانی هەرچی هەیە بە پیشكەوتنیان لەقەلەم داوە .

ئەوانەی بە ووردی لە عەبەسیان كۆلیتەوە پێیان وایە بۆچوونەكانی عەبەسی سەرچاوە لەوە دەگرێت كە ئەوجیهان وبوونەوەرە تەنها دووبارەبوونەوەیە رۆژهەلدێو ئاوادەبێت ودەنوین وهەلدەستینەوە لەناكاو دەمرین ..، پێیان وایە ژیان وكاری مرۆڤ بە هۆی هۆكاری مەعقوول بەرپا نەبوە ، یاساو ڕێك وپیكی نەلەو گەردوون هەیە نەلەناوكۆمەلگە ، بەتایبەتی دوای زال بوونی زانست دەلێن هەست وئەقلیشمان لەدەست داوە ، وامان لێهاتوە خۆمان لە سروشت و

کۆمەلگەو هەتا لە خۆشمان نامۆ بین ،ئەوەی یارمەتی زیاتری ئەو بۆچوونەی دان راسلی فەیلەسوفیش ووتی ئەو گەردوونە بێسەروبەر وبێ مانایە .

بۆچوونی عەبەسیەکان پەلی ئاویشتوە بۆ بەشەکانی تری زانستیەکانی سیاسی وکۆمەلایەتی ویاسایی وزۆر لای تر،شۆڕش وڕاپەڕین بە بێماناو شێتانە وەسف دەکرێ ،لێرەوە عەبەسی لەگەل زۆر لای تر لێك نزیك دەبنەوە، هەندێك زاناو فەیلەسوف هاوسەنگیەکەیان نەدۆزیەوەو هەمو جۆرە شۆڕشێکیان بە (نا عەقلانی ) وەسف کرد، هەریەکە لە نیتچە، گۆستان لوبون.. وەك عەبەسیەکان وەسفی شۆڕش بە بەدۆخی (لا شعوری-بێ هۆشمەندی) و هەتا بە (بەربەر)یش لە قەلەم دەدەن، مالرۆ: هەر شۆڕشێك ئابووری نەبێت (ثورة بلا سبب)ە یان (ثورة لا عقلانية)یە،. شۆڕش ئەخلاقی و ئاینی و مەبادیئی و عەقیدەیی و مانایەك نابەخشێ. هەرچی پرۆتوکولات حکماو صهیون: (الثورة لیست اكثر من نباح كلب على فيل- پرۆتۆکۆلی (19) ، هەندێ زانای ئاینی تایبەتیش (عادەتەن پێیان دەووترێ (سەلەفی لاجهادی) کەنزیکن لە دەسەلاتی سعودیە هەمان ئەو ڕایەیان هەیەو لایەنگیری شۆڕش ناکەن .

لەکوردستانیش کتیبی (سەگوەڕ)کە لەسالی 1982 لەلایەن نوسەرێکی گەورەی کورد نوسرایتەوە و شۆڕشی کوردی بە (سەگوەڕ)شوبهانبوو .. لەڕاستیدا لایەنی بنەمای شیوعیەت عەبەسی تێدایە ،کاتێ لەقۆناغی شیوعیەت باس لە نەمانی یاساو حکومەت ومولکیەت دەکرێ ، هەندێ لای تری عەبەسی لە بێیاسایی و فەوزا لە خزمەتی سیستەماتیکی گەندەلیە ...لەگەل زۆری تر.

هەلسەنگاندنیان:

دوای دۆزینەوەو گەشەی عەقل وزانست بەتایبەتی(هاوسەنگی سروشتی) دەرکەوت ئەو نارەزاییەی (کلۆز) هیچ بنچینەیەکی نیەو لە گریمانەیەکی هەلە بیناکراوە ،دەرکەوت دوورترین ئەستێرە پەیوەندی بە سروشتی سەر زەوی هەیە لە چوارچێوەی (هاوسەنگی گەردوونی) ،پەیوەندی بە ژینگەش هەیە،ئەگەر هەر کۆمەلەی خۆر هەبوایە بۆیەك چرکەش ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو ،بۆیە تەواوی ئەو

گەردوونە پێویستە بۆ ژیان ، هیچی زیادە نیەو نوقستانیش نیە ، مارو دووپشك و بەراز بۆ كوشتن دروست نەكراون ، ئەو ڕەخنەیەی عەبەسیەكان لە جێی خۆیتی ، چۆن دەبێت زیندەوەریك خوا دروستی كردبێت كەچی یەكسەر فەرمان وفتوای كوشتنیان بۆ دەرچووبیٚ؟ وەك لە (فواسق الخمسه)فقهی ئیسلامیش هاتوە : فعَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( خَمْسٌ مِنْ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ : الْعَقْرَبُ وَالْحِدَأَةُ وَالْغُرَابُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ ) ...قال أبو محمد : وقرأت في التوراة أن نوحا - ص - لما كان بعد أربعين يوما فتح كوة الفلك التي صنع ..( ثم أرسل الغراب فخرج ولم يرجع ، حتى يبس الماء على وجه الأرض ، وأرسل الحمامة مرة بعد مرة فرجعت حين أمست وفي منقارها ورقة زيتون ، فعلم أن الماء قد قل عن وجه الأرض فدعا الله تعالى لها بالطوق في عنقها والخضاب في رجليها )...،ئەوەلەكاتێكایە چۆن هاوسەنگی سروشتی ساغی كردەوە هەمو بەشەكانی سروشت تەواوی بوونەوەریان پێویستە ئاواش (هاوسەنگی بایۆلۆجی )تەواوی زیندەورو دارو درەختیان پێویستە ،ئیستا ڕوونە ئەو دۆخە سروشتیەی (زەمین) پیویستی بە ژینگەی زیندەوەران و ژینگەی سروشتی وژینگەی گەردوونیش لەرۆژ ومانگ وهەسارەو ئەستیرەو تەواوی گەردوون هەیە، لەوەوە زەمین ناسنامەیەكی میتافیزیكیشی هەلگرتوە.

ئەو نارەزایی وبۆچوونە جاران بۆ سروشتی دەوری زەویش هەبوو ،دەووترا لە جیاتی ئەو هەمو ئۆكسجنە بافۆسفۆر بوایە لەجیاتی ئەو هەمو ئاوە نەوت بوایە لەجیاتی بارینی بەفر شەكر بباریبایە ..،لە ڕاستیا هەریەك لەو گریمانا بهاتبایە دی ژیان نەدەبوو نەبەردەوامیش دەبوو ،مەگەر ئۆكسجین ئاوا زۆرنەبوایە وبەردەوام دارو درەخت بەهۆی (رۆشنە پیكهاتن) دوەم ئۆكسیدی كاربۆنیان بۆ ئۆكسجن نەگێرابوایە ژیان ئیستا تەواو ببوو ،ئەوانە هەموی لە چوارچێوەی (هاوسەنگی سروشتی) و(سلم الترتیب)ی بوونەوەر چارەسەركراوە ، یان وەك لەهەرەمی ماسلۆ بێت بۆ پیویستیەكان ، لەماسلۆ مرۆڤ پیویستی بە ئۆكسجن وخواردن وخواردنەوەو ئینجا سەرووتر ژیانی جنسی كۆمەلایەتی و تامرۆڤ پیویستی بەمادەیەك زیاتر بێت لەسروشت زیاتر هەیە ،ئۆكسجنی زۆر پیویستە لە هەوا

هەیە بیئەزیەت ،نۆرەی ئاودێت کە ئۆکسجین بەردەست نیە، تا دەگاتە کەمالیەکان زیاتر تەقەلای دەویٚ وکەمترە ..بەو شێوەیە فلسفەی مولکیەتی تایبەتیش لێرە دیاری دەکریٚ ئەوانەی زۆر پیویستن مولکیەتی گشتین دەبیٚ دەولەت پاریزگاری لێبکا،ئەوانەی کەم پیویستن بۆ کەمالیاتە دەکەویتە بەر چالاکی مولکیەتی تایبەت وکۆکردنەوەو هەلگرتن ،لێرەوە فلسفەی بازرگانی وشارستانیش دیاری دەکرێت ،ئال وگۆڕو بازرگانی وشارستانی لە کەمالیاتەکان زیاتر بەرپا دەبێت،لەوەی پیویستیەکانی هەرە بنچینە لەهەمو شوێنیك هەیە بەلام کەمالیاتەکانی ژیان لەهەمو شوینیك نیە لیرەوە ئالوگۆڕو بازرگانی وناوەندی ئەو بازرگانیەو شارو ئیدارەو دەولەت دروست دەبێت .

بەو شێوەیە ئـەو بوونـەوەرەو سروشـت وژیـان فـەوزاو عـەبەسـی نیـە بـەلکو سـازان وهەماهـەنگی وتەواوکاریە ، لە بۆچونی یەکەما زەمینەیەکی مولحیدیت بۆ ئامادە دەکا لە دوەمیشـا زەمینەیـەکی باوەڕی،لەیەکـەما عـەبەسـی وگوێپینـەدان خۆویسـتی ولاوازی مرۆڤایـەتی ودادگـەری ،لـەدوەما پیچەوانە.

لەبارەی ڕایە فلسفسە عەبەسیەکانی هیگل و ئەنجلس وشۆبنهاوەرو راسلیش ....،گوایە ئەو بوونەوەرە بریتیە لە فەوزای سەرتاسەری ، بەلکوهەماهەنگی سەرتاسەری هەیە هەروەك لە کۆنەوە ئەکزیۆمی پینجەمی ئیکلیدس بەناوی (مبدأعدم التناقظ-Consistenc )[1582] هاتوە، هەر لەلای فلسفەی مادیش لەدوا ساتەکانی لە بۆچوونە عەبەسیە پشێمان بوونەوە ، ستالین لەدوای ئەوانە هات هەرچەندە لایەنگری ئەو گەلالەلانە بوو بەلام کاریکی تری کرد لە کتیبەکەی(المادیە الدیالکتیکیە والمادیە التاریخیە) یاسای (إلتحام العام)ی دانا ،کەلەگەل ئەو گەلالەیەی ئەنجلس وهیگل تیك ناکاتەوە،لەگەل عەبەسی تێکدەگیریٚ، زیاتر لە گەلالەی فلسفی ئاینی(هەماهەنگی بوونەوەر) نزیك دەبیتەوە .

---

1582 Law of Non-Contradiction / Loi de Non-Contradiction /قانون عدم التناقض قانون منطقي لا تكون بمقتضاه القضيتان أ أو لا أ) أنظر النفي) صادقتين في الوقت نفسه وجاءت الصياغة الألى لقانون عدم التناقض على يد أرسطو . ويمكن صياغة هذا القانون على النحو التالي:
القضية أ لا يمكن أن يتكون كاذبة وصادقة في آن واحد .وهو بالكتابة الرمزية :أ .أ حَيث (.) هي علاقة العطف .والخط فوق الرموز هو علامة النفي .ويلعب قانون عدم التناقض دورا هاما في التفكير والمعرفة .وتصبح الاحكام أو النظريات العلمية غير متماسكة عندما تحتوي على تناقضات صورية. وقانون عدم التناقض هو انعكاس في العقل للتحدد الكيفي للأشياء، أي للحقيقة البسيطة القائلة بأنه إذا أمكن استخراج تجريد من تغير ما في الشيء نفسه، فإنه لا يمكن أن يتصف في الآن نفسه بصفات تستبعد كل منها الأخرى__ (موسوعة الماركسية)

بەو شێوە ئەو بوونەوەرە بریتی نیە لەناکۆکی و فەوزای سەرتاسەری،عەبەسی نیە وەك لەقورئانی پیرۆزیش وادەلێ(افحسبتم انما خلقناکم عبثا وانکم الینا لا ترجعون)، لە ئینجیلیش (5)جار ناوی (عەبەس)ی هێناوە، بەڵکو هەماهەنگی سەرتاسەری هەیەلەتەواوی بوونەوەر،لەنێو خۆولە نێوسروشت خۆبەخۆ،سروشت لەگەل ژیان ،ژیان خۆبەخۆ،تادەگاتە مرۆڤ،لەوێش مرۆڤ خۆبەخۆولەگەل سروشت وژیان وتەنانەت لەگەل خودی خۆشی،تیایدا رێکخستنێکی ئامانجدار بەرهەم دێنێ ،بونەوەر هەر لە بچوکترین تەن تا کەشکەشان هەر هەموی بە یاسا کاری کردوەودەکا،بواری یاخی بوون نیە .

تاڵە موویەك لە ڕوومەتی پڵنگێك بێئامانج وعەبەسیانەلەخۆڕا دروست نـەکراوە ،ئەگـەر ئـەو تالـە موە بەتەواوی لە(نەژادی پلنگ) لابدە بەماوەیەك هاوسەنگی سروشتی تێکدەچـێ ،ڕەنگـە تێکـڕای تەمەنی نەژادی پلنگ تەنها 5000سال دەوام بکـاو لـەناو بچـی یـان زیـاد بکـا، لەهـەردووباردا دیزاینەکە تیك دەچی ،بەهەمان شێوە هەرزیادی وکەمیەك لە پۆلەکانی تری ژیـان هـەمان ئـەنجامی گەورەتری دەبێت،ئەگەر بالت لە کۆتر ستاندەوە داتە دووپشك ،ئەگەر قاچت لە مامز ستاندەوەو داتە مار ،ئەگەر عەقلت لە مرۆڤ ستاندەوەو داتە مانگا ، یان بە پیچەوانە تێکڕای ژیان تیکو پیك دەچی ،نەك هەر ئەو ئالو گۆڕە بەلکو زیادەو کەمیەکیش، تەنها باڵ بۆ مرۆڤ هەبێ کەوادەردەکەوێ(نعمەت بێت)ژیان نامێنێت،..بەهەمان شێوە هەرزیادی وکەمیەك لە ڕێژەی ئاو وئۆکسجین وقەبارەو خێرایـی زەوی مانگ رۆژ تەواوی بوونەوەر هـەمو هاوسـەنگیەکان تیـك دەچـێ وژیـان نـامێنێ ئـەو جـۆرە دێزاینەی گەردوونیش نابێت ،جانازانین بیجگە لەو دێزاینە گەردوونیەی هەیە بوار هەیە دێزاینـی تـر هەبێت ،نازانین و واپیدەچی نـەبیت ،ئـەوە بـەجارێك بـوار لەبـەردەم عەبـەس و سـودفە و ڕەمـەکی هەلـدەگرێ لەهـەمان کـات بەیـەکجاری بـوار لەبـەردەم بیرکردنـەوەش لـە تیـۆری تەتـەورو پەرەسەندن(بەتایبەت البقاء للأصلح) وهەرسێ یاسای مادیـەی دیالکتیك(یاسـای نـاکۆکی-یاسـای وەرچەرخانی گۆڕاننکاریە چەندایەتیەکان بۆ چۆنایەتیەکان — یاسای نەفی نەفی) .

لولایەکی تریش مەرج نیە ئەو هاوسەنگیەی(هاوسەنگی سروشتی) چەسپاوو ستاتیکی بێت،لەناوەخۆ گۆڕانی بەردەوام هەیە لەدەرەوەش، جاریش وایە لەسەر ئاستی هاوسەنگیش دەگـۆڕێ ئەوکاتـە پێـی دەلێن هاوسەنگی گۆڕاو ، واتە خودی گۆڕانی هاوسەنگیش لە چوارچێوەی هاوسـەنگیە ،مقەیـەدە ،

وەك هاوسەنگی نێوان هێزی تیهەلدانی ناوەندی(طرد مركزي)گەردوونی وهێزی كیشكردنی ناوەندی(جاذبية المركزية )گەردوونی ،كە لە فراوان بوونی گەردوون گوزارش بوە ،ئەوە بەكارەو لە گۆڕانیشە ،هاوسەنگیەكی گۆڕاوە ،تیایدا ئەجەل وتەمەنی گەردوونیشی پێوە دیاری دەكرێت ،ئەگەر ئەوجۆرە هاوسەنگیە نەبوایە فراوان بوونی گەردوونی یان نەدەبوو یان دەبووە موتلەق ، ئەو گۆڕانەش بەیاساو هۆكارولۆژیكیانەیە ...

بەو شێوەیە ئەو بوونەوەرەو سروشت وژیان فەوزاو عەبەسی نیە بەلكو سازان وهەماهەنگی وتەواوكاریە ، مرۆڤ بە عەبەسی وبێماناو دابڕاو و بە سودفە نەهاتوە ،بەلكو بەئامانج وبەرپرسیاریەتی هاتوە ، ئەو بێئومێدیە لە ڕوانگەیەكی مادی پەتی و لە بڕوانەبوون دێت ، ئاینەكان وەلامیان هەیە و دەلێن نیگەرانی و ڕەشبینی و درامی لە نەبوونی پەیوەندی لەگەل خودا دێت وەك لە قورئان دەلێت: (الا بذكرالله تطمئن القلوب) بەهەمان شێوە ( قەدیس ئاگستینوس) دەلێت ( یا رب لقد خلقتنا متجهين إليك ولذلك لن تجد قلوبنا راحة إلاّ إذا استقرت فيك ) ، زاراوەی (طقس)كە ئیستا كاری عەبەسی پێدەكرێت لە هەندێ ئاین ومەزهەب لەبنەچەدا مانای رژێم وڕێك وپیكی ومەجەستی ، چەندین ئایەتی (ئینجیل)داكۆكی لەو رژیم وناموسە دەكات 0وَلْيَكُنْ كُلُّ شَيْءٍ بِلِيَاقَةٍ وَبِحَسَبِ تَرْتِيبٍ- 1 كو14: 40). لە تەوراتیش( ... أمر الله موسى النبي أن يرتب العبادة، وينظمها حتى تكون في مجد. وطبعًا بالأولى جدًا أن تكون خدمة العهد الجديد أكثر تنظيمًا وأكثر مجدًا "لأَنَّهُ إِنْ كَانَتْ خِدْمَةُ الدَّيْنُونَةِ مَجْدًا، فَبِالأَوْلَى كَثِيرًا تَزِيدُ خِدْمَةُ الْبِرِّ فِي مَجْدٍ!- 2 كو3: 9) . وكان معيار الخدمة في العهد القديم أنها على "ترتيب (طقس) داود ملك إسرائيل- عز3: 10)، تەنانەت ئەو میلەتانەی ئاینیان بە ڕێكی نەمابێت هەر ئەفسانەش بێت باوەڕی بە سیستەم ورژێمی گەردوونی هەبوە نەك عەبەسی، (قاموس الخرافات )هاتوە: بۆمبا خوای یاساو سیستەم ووئیدارەی گەردوون بوە ،بەهەمان شیوە تیمیس خوای یاساو دادگەری یۆنانیەكان بوە[1583]...، دیسان لێرەش دەگەینەوە پۆلینێك كە فەوزاو عەبەسی و بێباوەڕی هاوتان ، باوەڕداری وسیستەم ولۆگۆسی وڕژێم ویاسا هاوتان ، لەتەورات بەرژێم ویاسا ووتراوە (ناموس) ، تەنانەت هۆبز پێی وایە زاراوەی قانون

---

[1583] قاموس الخرافات والاساطيرص79وص88 .

(كانون) له ئيمان هاتوه له ياساى ئيمان واته ياساى خوايى[1584]، ڕەنگه كانون كەبەراسته داريش ووترابێت بەو مانايەى ( صراط المستقيم) ، (موسوعه لالاند )يش له شێكردنەوەى چەمكى كۆسمۆپۆلۆتيك دەلێت: (علم كون برهان على وجودالله) —برهان حدوث العالم مقابل كون الساكن — مجستى )فيساگۆريەكان كۆسمۆلۆجيايان بەكاردەهينا وەك گەردوونيكى ڕێك وپێك (دژ بەعەبەسيب) ماناى سيستەم ورژيمى گەردوونى .

<u>ڕاى مەدرەسەكان</u> : هەرچەنده زۆربەى مەدرەسەو تەيارەكان دژى عەبەسين ،كەچى ئەگەر بەووردى سەرنج بدەين دەبينين پشكى عەبەسيەت لەهەموو مەدرەسەو باڵ وتەيارەكان بەدى دەكرێ ،بەلام ديسان پرسيارەكه ئەوەيه كەى لێيان بەدى دەكرێ ؟ لەو كاتانەيان كه زۆر توندوپەڕەگر دەبن ،توندیش دەبێته بيسەروبەرى وفەوزا ،له فەوزاش كارى عەبەسى دەكرێت ، بەو شێوەيه عەبەسى له نێو شيوعيەكان وئاينيەكان وليبراليەكان وناشيۆناليزمەكان هەيه ، لەماركسيەكان تەيارى توندى وەك بادرماينهۆڤ وئەلويه حمراو پۆلپۆتى و ..،لەهەموان عەبەسى تر باكۆنينى بوو، باكۆنين به (ئەناركى -فوضوى)هەژماردەكرى، له ماركس زياتر دژى بوونى دەولەت وموڵكيەت و(تەنانەت دژى سيستەمى ديموكراسيش بوون) وهەتا دژى ياساش بوون ،لايەنگرى تيرۆر وخوين ڕشتن بوو له پيناو هينانەدى سۆشياليستى خاوەنى دروشمى (تحطيم كل ماهو واقع خير) ،زۆر دژى ئاين بوو (كتيبى :الله والدوله)هەبوو ، هەريەكه لەكرۆبۆتكين و برۆدۆن وفۆرۆوەك ڕاى عەبەسيەكان خواستيان ئەوەبوو (ئەمريكى ئازادى رەها بۆ هەر تاكيك دادگەرى دروست دەبيت) ،بۆيه به پێى(موسوعەى لالاند) ئەناركيش لاى زۆربەيان جۆريكه لەدەسەلات[1585] ،لەڕاستيدا ئەو ڕايانەى(باكۆنين) هەرناگەڕێتەوە بۆ توندڕەوى ماركسى بەلكو گوزارش له بەشيكى گرنگى ماركسيەتى ڕاستەقينەش دەكا ،هەرلەبارەى

[1584] هۆبز -اللفيثان..ص500

[1585] الموسوعة لالاند الفلسفية ج1 ص484

نەبوونی یاساو (بیسەروبەری) ،(لینین) پێی وایە وەك چۆن خەلكی ناهێلن دووكەس شەڕ بكەن ئاواش بۆ كیشەكانی تر یاسای ناوێ خەلكی خۆیان یاسان لەقۆناغی شیوعیەت[1586].

لە ریزی ئاینیەكانیش هەر كاتێ توند بووبن كاری عەبەسیان كردوە ،دژی زانست وشوێنەوارو شارستانی وەستاون ،بەشێك لەوەش زیاتر پێیان وایە عەقلی جەمعی عەقلیكی عەبەسیە ،لەوانە دوركایم زۆر بەووردی تیبینی ئەو دۆخانەی كردبوو ،كە عەقلەكان بەتەنهاو دانیشتن عەقلانین ،بەلام لەناكاو لە چركەساتی هەلچوون ولەسەر شەقام بڕیارو كارەكانیان عەبەسیە ،وەك تیكدانی پرد وبینایەوپرۆژەی تر لەسەردەمی شۆڕشی فرنسی .

لەلایەكی تریش عەبەسی وسریالی ودادائیش تاڕادەیەك لیك نزیكن،هەردووكیان جار وایە سەرێكیان لای فلسفەی سەفسەتایی بوە سەرەكەی تریشی لای میسالی زاتی ، دادائی(كە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەكەم سەری هەلدا)لەسەر دەستی (تریستان تازارا)گەڕانەوە بۆ كۆمەلگەی سەرەتایی بە نوێبوونەوەی ڕاستەقینە دەزانی ، كۆمەلێك بوون لە بیئومێدیا ژیانیان بە گالتەجاڕی وەسف دەكرد ، سیریالیش پێی وایە ئەو واقعەی دەیبینین ڕاستەقینە نیە ،لەپشتی جۆرە واقعیكی تر هەیە ئەو ڕاستەقینەیە،كە پێی دەووترێ سەرووی **واقع**( تعني كلمة السّريالية في اللغة الفرنسية مذهبَ ماوراء الواقع. والواقعُ ماهو موجود" سواءٌ في عالم المادّة أم الحسِّ أو الوعي" أي مايدركه الإنسان مباشرة في العالم الخارجي أو مايشعُر به ويعيه في عالمه النفسي. والسّرياليّة لاتهمل هذا الواقع، ولا تنكره ولكنها لاتثق به ولا تعوّل عليه. فهو في رأي بروتون زعيم السريالية "معادٍ لكلّ ارتقاء فكريّ وخُلُقي)[1587]،پشت واقیع بەمانای زۆربەی جار نیازەكانی بەشەریەت شاردرایتەوە ،ئیش كردن لەسەر واقعی سەروو بەرهەمی هەیە نەك واقعی ڕاستەوخۆ،بەو شێوەیە بناغەی عەبەسی لێرە سەرهەلدەدا ، یان وەك (ئەرنست فیتچ)دەلێت باوكی ڕاستەقینەی عەبەسی سیریالیە ،سودیان لە ماركسی و فرۆیدیەوداروینی ووجودی وتویژینەوەی تریش وەرگرتوە .

---

[1586] الدوله والقانون فى الاتحادالسوفيتى –تاليف:مجموعه من علماو سوفيت ،ت: هنرى ريچ (ترجمت باسم (القانون والاشتراكيه) ص20

[1587]بروتون– بيانات السريالية- وزارة الثقافة- دمشق. ص17-

لەسەرجەمیشدا ڕای زۆربەی مەدرەسەکان پێچەوانەی عەبەسیەتە، باشترین بەڵگەش ئەو سیستەم و پەیوەندی و بەرپاکردنی یاسای نێودەوڵەتی و مافی مرۆڤ و نەتەوەیەکگرتووەکان و دەوڵەتداری پێچەوانەی ئوسولی عەبەسیەتە، کەواتە ئەوە جێ ی لە مەدرەسەی لیبراڵی و ڕۆژئاوای نابێتەوە لەمەدرەسەی شیوعیەتیش زۆر بەتوندی دژی عەبەسیەتن، بەپێچەوانەوە ئەوان پێیان وایە گەشە و جموجۆڵ و تاك و کۆمەڵگە نەك هەر ئامانجدارە بەڵکو لە چوارچێوەی (حەتمیەتی مێژووییە) ،واتە سەرەنجامەکانیشی بۆ ڕەسم کراوە، لە مەیدانی سیاسیش لینین زۆر بەووردی زاراوەی پیشڕەوایەتی داهێنا لەبەرامبەر کاری سیاسی عەبەسی و ووتی: وادەکا کاری سیاسی لە ڕەمەکیەوە وەرچەرخێنیە نەخشەو پلان وئامانجدار[1588]،ئەوەی تەیاری عەبەسی بەهێز دەکات لەبونەوەرە،هەندێ بەشی زانستیشە ، بەشیکی زۆریش لە مەدرەسە فەلسەفیەکانی مادی وەك وجودی لایەنگری ئەوەن کە ئەو گەردوونە بە ئامانج نەهاتووە، بەڵکو ڕێکەوت و گەشەکردنی وجاغ کوێر ڕۆڵی خۆی دەبینێ، بەتایبەت لە پرۆسەی ( خلق- پەیدابوون) ئەوەیان زۆر زیاتر فراوانتر دەبێت لە فەلسەفی مادی ، ئەگەرچی لەسەروو دیاریمان کرد دژی عەبەسین وباوەڕیان بە (حەتمیەتی میژوویی)هەیە کەچی لێرە تووشی ناکۆکی دەبنەوەو دژی ئامانجداری بونەوەرن،بەتایبەتی (تەتەوریەکان)، لەسەر ئەو بنچینەیە (بۆخنەر) و(داروین)و (ئەنجلس) زۆر بە توندی بەگژ ئەوە دەچن کە جم وجۆل وسیستەمی سروشت مەبەستدار بیت ،ئەنجلس دەڵێ (لقد ولت الغائیە القدیمە دون رجعە)[1589]، (ستیڤن واینبرگ)یش دەڵێ چەندە توانای گەردون فراوانتر دەرکەوێ بیرۆکەی ئامانجداری(غائیە) لاواز دەبێ، جاك مۆنۆی بایۆلۆجی زان هەر وای بۆچوە[1590]، جیمس وبراتراند راسل دەڵێن: (ئەو جیهانە پارچە پارچەو بێ سەروبەرەو بێ هەماهەنگە نەك وەك مەکینە بێت)[1591]، ئەو بۆچوونانە پیچەوانەی زۆربەی زانایانە

[1588] إرنست ماندل- النظریة اللینینیة في التنظیم- ترجمة: کمیل داغر الناشر: دار الطلیعة – بیروت ص11 .

[1589] ف انجلس-دیالکتیك الطبیعة ص224 دوای هەر لە ص240 زیاتر مەبەستی لە(غائیە) ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ مەبەست خوایە، دوای لەهەر خودی ئەنجلس وهاوڕێکانی مارکس ولینین وبلیخانوف لە باسی گەشەی کۆمەڵگەو شیوازی بەرهەم هینان تیۆری (حتمی تاریخی)جاڕ دەدەن کەمانای (غائیە).

[1590] بول دیفیز- الإقتراب من الله ص219

[1591] مدخل الی الفلسفة ص283

که دەڵێن هەر هەموو پارچەکانی بوونەوەرلەپەیوەندین لەگەڵ ئەوی تر و مانای گەردوون تەواو دەکەن، لەوەوە (دیراك) دەڵێت پەیوەندی بوونەوەر هەموی بیرکاریانەیە[1592].

ڕەهەندی عەبەسی زۆربەی لقە زانستیەکانیش دەگرێتەوە، بەتایبەتی زانستی کلاسیکی، لەو سەردەمەش زیاتر فیزیای کوانتەم لەو بوارە دەجەنگیو جارێکی تر گیانیکی وەبەر (عەبەسیەت)کردۆتەوە کردوویەتەوە بە زاراوەو چەمکیکی سەردەم،ئەو فیزیایە پیێ ی وایە تەنۆلکە بچوکەکان پابەندنین بەهۆکار و ئامانج بەڵکو عەبەسیانە کاردەکەن، لەوەوە یە جارێکی تر تەیاری عەبەسی دەژیتەوە.

مەترسی تەیاری عەبەسیەت هەر لە زانست وفلسفەو ئەدەب قەتیس نامێنیت ،بەلکو بەرەو سیستەمی کۆمەلایەتی وسیاسیش دەڕوا کاتێك داوای کۆمەڵگەیەکی لیبرالی وئازادی ڕەهادەکەن ،دەلێن نابیّ مرۆڤ بە مەعقولیەت و لۆژیك و سیستەم لە قالّبی بدریّ، لیّ ی گەڕیّ هەرکە بۆخۆی چۆن دەژی بژی، لەگەل مدرسەی لیبرال لەوە تیك دەگیرین کە ئازادی رەها بە مرۆڤ دەدا ئەگینا لە ڕووی (indivd) تاکژیانی—لێك نزیکن ،هەرچی ڕای ئایینە پێی وایە ئەو بونەوەرە و گەردوون و سروشت و (خلق) هەرهەمووی بە دانایی و زانایی هاتوون بە یاسا و رژێم کاردەکا و بیّ سەروبەر نیە، هەمویی ئامانجدارە بیّ سەرو بەرو عەبەسی نیە ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ ﴿..وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً﴾[1593]، بە یاساو ڕێسا ئامانج و مەبەستی بۆ داڕژراوە، لەوەوە جۆرج کۆڤیر (1769-1832) گوتی هەر لەبچووك ترین تا گەورەترین هەموی مەبەستدارە، پیشو تریش تۆما ئەکوینی ووتبووی هەرچی شت ومەك هەیە لەو گەردونە وادەجولیّ وەك ئەوەی ئەرکیکی خۆی جیبەجیّ بکا وئامانجیکی چاکتر بپێکی[1594]، ولیام بالی وسیر جیمس جهانیان بە مەکینەیەکی گەورە وەسف کرد.. (نیوتن) پێش هەموان لەو سەردەمەدا وتی هەموو پارچەکانی بوونەوەر وەك سەعاتێکی قورمێشکراو بەڕێوە دەچێت، هەموی دوورە لە عەبەسیەت، هەتا خودی تەتەوریش ئامانجدارە هەروەك جوهان مەندەل (1822- 1884)

---

1592 There is agod how the worlds most notorious atheist changed his mining p - A.fluo

1593 سورة مؤمنون اية115، سورة ال عمران اية 191

1594 بول ديفيز- الإقتراب من الله ص225

دۆزیەوە کە (گەشەکردن)یش لەخۆرایی وعەبەسیانەو بیٚ مەبەست نیە،لە کۆنەوەش  ئیکلیدس لە سەر بنچینەی (ئامانج ورژێم وترتیب) (دژ بە عەبەسیەت) ئەندازەی دارِشت بەئەکزیۆمی پینجەمی ئیکلیدس بەناوی (مبدأ عدم التناقض-Consistenc)، کیپلەریش لەسەر هەمان بنچینە بۆچونەکانی لەکتیبیك بەناوی(التوافق الکونی )دانا  بەمانای سازان وهەماهەنگی گەردوونی ، لەوەوە تۆماس ئەکوینی و نیوتن و ولیام بالی و لەو سەردەمەش سیر جیمس ووتیان ئەو بوونەوەرە دەلێی کاتژمێرە هەر بەشەو بەشەکانی تر تەواو دەکا (ربنا الذي اعطی کل شیئ خلقه ثم هدی ) ،لەوەش کۆمەلگەو سیستەم وریکخستنی نەك هەر بۆ دنیا پیویستە بەلکو لە دوا رۆژیش پاداش وسزا هەیە ،کەچی تەیاری عەبەسی داوای ئەوە دەکا نەك لە دوا رۆژ لەسەر ئەو دونیایەش سزاو پاداش نەبێت کە بنچینەیژیانە،بۆیەش(موسوعەلالاند)عەبەسیوەسفی زاناکانی عەبەسیشیبە(لاعقلانیون)کردوە[1595]
.

---

[1595] موسوعەلالاندالفلسفیە ج3ص1527

(57)

# هۆڵۆکوست (المحرقه) Holocaust

ئەوانەش دەگریتەوە (ئەنتی سامی ،شەواھ، ھیدریتچ،شەوی بلۆر،mine comfe - (کفاحی)، ھیتلەر،(sub-man)انسان غیرکامل، عبری، پۆگرۆم ، ..)

بەو ھەڵمەتە توندەی نازیەکانی ئەڵمانیا دەووترێت (ھۆلۆکۆست) کە لەکاتی جەنگی جیھانی دووەم کردویەتە سەر یەھودیەکان، ھەر ئەوەندە پیناسەی ھەیە ھەروەك (معھد السلام الامریکی) وای پێناس کردوە[1596]، دوای ئەو ھەڵمەتە ھەندێ شوێنی ئەوروپای گرتەوە، ئەوکاتی یەھودیەکان بۆئەو ھەلمەتە زاراوەی (شواھ)ی تەوراتیان بەکاردەھێنا بەمانای (کارەسات)،دوای ناویان نا ھۆلۆکۆست ،کە زاراوەیەکی کۆنی یۆنانیەلە(ھۆلۆکۆستۆن-ὁλόκαυστον)ھاتوە، ئەوکاتی مانای( سوتاندنی تەواوی ئەو قوربانیانەی پێشکەشی خودا کراون)دەھات، یان وەك (الموسوعه الیھود)دەلیت (حرق القربان بالکامل)[1597]، لە کۆن ترین مەعجەمی لاتینی –عربی ھەر بەمانای (قوربانی – بەلاگێڕ) ھاتوە[1598]، ئەو زاراوەیە لەدوو بەش پێکھاتووە ھۆلۆ واتە سوتان، کوستون واتە ھەموو- تێکڕا، مانای سوتاندنی ھەموان، لەسەدەی 19 ئەو زاراوەیە بۆ کارەساتە گەورەکان ھاتەکایەوە، یەکەم جار زاراوەی ھۆڵۆکۆست بۆ ئەو ڕەفتارە دڕندەیەی ھتلەر و نازیەکان بەرامبەر یەھود لە 1942 بەکار ھات، ئەو زاراوەیە بە تەریبی لەگەل زاراوەی (جینۆساید) ھاتنەوە کایەوە، ئەوەش یەکەم جار پاریزەرەی پۆلەندی یەھودی (رافایل لەمکین1900-1959) بەکاری ھێناوە لەسالی 1944، بۆ ئەو کوشتوبڕەی بە پالنەری ئاینی ورەگەزی ومەزھەبی کراوە، لە دوو ووشە پیکھاتوە (geno-) بە یۆنانی مانای (کۆ)دێت کۆی عەشیرەت یان سەرجەلە، ووشەی دوەم (cide-) واتە کوژی ،بەو

---

[1596] معھد السلام الامریکی (حل النزاعات بین الادیان) –مرکز التعلیم والتدریب-2008 ص 100.

[1597] بۆ زیاتر لەو ... الموسوعه الیھود والیھودیه والصھیونیه ج1 ص169

[1598] موسوعة المستشرقین –د عبدالحمن بدوی –دارالعلم –بیروت 1993 ط3 ص556

شێوەیە هۆلۆکۆست وجینۆساید یەك جەوهەریان هەیە ، لەگەل (هۆلۆکۆست)چەند زاراوەیەکی تری هاوتا سەری هەلدا : جینۆساید-(محرقه) —المشواه-هوربان- ،محرقه دوای ئەوە هات کە دەیانخستنە ناو ئەو فرنیانەی کەلەبنەچەدا بۆ ئەو جۆرە نەخۆشانە دروست کرابوو کە مەترسی بوون بۆ بلاوبوونەوە.

دوای شکستی نازی ئەلمانی و دروستبونی دەولّەتی ئیسرائیل ئەو زاراوەیە بە جیهانی بوە،بوە بەشێك لە تاوانی کۆکوژی بە پێی ڕێکەوتنە نێودەولەتیەکانی رۆژی9 \12\ 1948 بەتاوان پۆلێن کرا ، دادگاییەکانی تاوانی هۆلۆکۆست هەر لە ئەلمانیا سازدرا وناوی نرا دادگاییەکانی نورمبیرج کەلە(1939-1945)ی خایاند،، دوایش لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیارِی(A/RES/60/7 ) ژ: 7/60 ی 2005/11/1 دەرچوو بۆ دووبارەنەبوونەوە (مادەی 6)،هەروەهالەمادەی (1)ی ئەو بڕیارِە رۆژی 27ی کانونی یەکەم بە یادی سالانەی هۆلۆکۆست دیاری کرا ،ئەو رۆژەی کە هێزەکانی سۆڤیەت لەرۆژی 27ی کانونی یەکەمی 1945 توانیان سەربازگەی زیندانیانی یەهود بەناوی (ئۆشۆیتەر وبیرکیناو) رزگاربکەن لە پۆلەندا، هەرچەندە هۆلۆکۆست شایستەی ئەوە بوو کە هەر هەلمەتیکی جینۆسایدی دژ بە میلەتانی ژێر دەستەو کەمایەتیەکان بگرێتەوە ،بەلام بە هۆی ناکۆکی عربی ویەهودی رێی لە گەشەی ئەو زاراوە گرتوە ببتە جەوهەری جینۆساید بەتایبەتی بۆ وولاتانی ئیسلامی،بەلام بە تێکرِایی یەك جەوهەر وماهیەتیان هەلگرتوە لەگەل باقی چەمك وزاراوەکانی وەك جینۆسایدو قرِکردن وئەنفالی کوردو وئەرمەنکوژی وموسلمان کوژی بۆسنیاو بۆرماو ..زۆر لای تر.

## ڕیشەی مێژووی هۆلۆکۆستی میلەتانی تر

قرِکردنی میلەتێك لەلایەن میلەتێکی تر لەناکاو نایەت ،کۆمەلێك پیشەکی کۆمەلایەتی وفەرهەنگی وکلتوری دێت ،جاروایە پیشەکی ئایدیۆلۆجی وئاینی و هەتا دەستوریشی هەیە ، لای سەروو خۆی بەگەورە ترزانیوە ،شانازی بە خۆی کردوەو لەبەرامبەریشدا ریزی میلەتە بچوکەکەی لا نەبوە (یا ایها الذین امنوا لا یسخر قوم من قوم عسی ان یکونوا خیرا منهم ولا نساء من نساء عسی ان یکن خیرا منهن ولا تلمزوا انفسکم ولا تنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الایمان ومن لم یتب فاولئك هم

الظالمون ) ، یەکەم شانازی شەیتان بە رەچەلەکی خوی فەزل کردنی بەسەر(ح . ئادەم)بە ڕیشەی هەمو جۆرە ڕەگەزپەرستی ودەمارگیریەك هەژمار دەکریٚ، لە مدرەسە هەرە روناکەکانی بەشەری کۆن ونویٚ رەگەزپەرستی لیٚ بەدی دەکریٚ، (ئەرستو)و (گروتیوس) مرۆڤەکانی پیٚ وەك (أسنان المشط) نەبووە، بەلکو بچوك و مەزن بەندەو ئازاد پلەی لیٚك جیای کومەلایەتی بووینە، هەتا هاولاتی سەردەمی کومەلگای ڕومانی هەرگیز هەژارو غەوارەو بەندەو ئافرەتی نەگرتوتەوە، لە کومەلگە دیموکراسیەکەی ئەسینیش هەروابووە، مەدرەسەی یونانی تا ڕادەیەك دوو ڕاو بوچونی جیای هەبوو، بالی لاهوتیەکان لەژێر کاریگەری کەلتوری ئاینی وابوٚ مرۆڤەکان دەچوون کە هەمووی لە قوڕن و کەس لەکەس گەورەتر نیە، هەرچی لابالی عەلمانی بوو پێیان وابو کە راستە هەموو لە قوورن بەلام (بەندەکان) لە قورێکی خراپن، ئەرستۆ لەکتیبی(رسالە السیاسە-پۆلیتیك) بەندایەتی گێڕاوەتەوە بۆ بڕیارێکی خوایی نەك کۆمەلایەتی ،دەلیٚ ئەوانەی عەقلیان کەمە کار بە جەستەیان زیاتر دەکەن ئەوانەن خوالەبنەرەتدا ئیجباری کردوون بۆ بەندایەتی وکڕین وفرۆشتن! لەسەر ئەو بنچینەیە دابەشیەکی ئەزەلی چینایەتی لە کۆمەلگە دروست دەکا ، دەیان ووت هەموو مرۆڤ لە قوڕە بەلاّم چینی ئۆرستوکرات ودەسەلاّت قوڕەکەیان لەلای خودا زیادەی تیکراوە و زیوی بوە ،هەرچی جوتیارو چینەکانی تری خواروو قوڕەکەیان بە مس وئاسن تێکەلاّوکرابوو ،لە بنەچەدا خوا بەشەرەکانی وەك دەمی شانە دروست نەکردوە[1599]، فارابی (مدینة الفاضلة)ی لەسەر ئەو بنچینە ڕێکخستوە،بۆ بونەوەر وسروشتیش و (ترتیب الموجودات)ی بە (فضل) ریٚز کردوە[1600]،لە هەموان ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملکوت الله) دەلیٚ (خواعەبدایەتی داهینا وەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[1601] .

لەسەر ئاستی دەرەکیش جۆرە زاراوەی تر بۆ خۆیان وبۆ میلەتانی تر بەکارهێناوە ، ئەوەی لەڕۆمان ویۆنان نەبوایە یان دژیان بوایە بە (بەربەر) دەخوێندرایەوە،یان سارینس ، ئەوەی ئاینی ئەوانیش

---

[1599] بڕوانە :جمهوریة افلاتون ص76 هةروةها برِوانة:مدخل الى الفلسفة ص64

[1600] فارابى —اراء اهل المدينة الفاضلة ص66

[1601] ماركسية قرن عشرين ص146

نەبوایە بە (ئیسنی) دەخوێندرایەوە، تەنانەت هیرودتس —کە بە باوکی میژوو ناوزەد دەکرێ ئەویش شەڕی نیوان ئاسیا وئەوروپی بەشەری بەربەر ومەدەنی لەقەلەم داوە، کاتی خۆی ئەرستۆش ڕای وابوو ئەوەی یۆنانی ڕەسەن نەبێت کۆیەیە ،هەروەها لەنێو شارستانی هندوسەکانیش ئەو دابەشیە هەبووە، براهما و شودرا چینیکی بالان وشۆدرائەوانەی لەو چینانە نەبوایە بە (مەنبووز)ناوزەد دەکران ، لەسەردەمی بابلی کۆنیش چینی ئۆلیم ومەشکینۆم چینی بالا بوونوئینجا چینی واردەم وکۆیلە-ئەوانە بەیاساییش کرا بوون لە یاساکانی حمورابی[1602]،لە هەندێ لایەنی میژووی سیاسی ئیسلامیش بەدی دەکرێت ،ئەوەی لەئەمەویەکان نەبوایە بە موالی ناو دەبرا یان (علوج)،... ئەو تیڕوانینە زۆر بە ڕوونی لە پانتاییەکی فراوانی فقهی ئیسلامی ڕەنگی داوەتەوە،بوویتە هۆی سەر هەلدانی فقهی (فەزلی عەرەب)، ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرموودە)ی وەك (حب العرب ایمان)، (العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)* لەکۆتاییدا دروشمی (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)ی لیێ هاتەدی .

لەناو یەهودیش ئەوەی لەوان نەبوایە بە (جویم  یان ئومەمی یان اغیار) دەخوێنرایەوەو بە چاوێکی نزم تر سەیر دەکران ،( زایف یهوژاك 1891-1982) دەڵێت: پیش ئەوەی مەسیح بیت دەبیێ دەسەڵاتی جیهان لەدەست یەهودی بێت داوادەکات کەس بەرگری لەو حەتمیە تاریخیە نەکات[1603]، لە(تیلمۆد -کە بریتیە لەتاکە تەفسیری موعتەبەر لەلای یەهودی) تەشریعاتی زۆر رەگەزپەرستی وسەرسورهینەری تیدایە،  غەش کردن زینا کوشتن و ئەزیەت بۆ یەهودی وغەیرە یەهودی زۆر لێك جیایە،وبنەچەی (شعب الله المختار) لەوە دێ،لە (بروتوکولات حكماو الصهيون)یش بە توندتر لەوانە هاتوە ، زۆربەی ئایدولوجیای زایۆنی لێرەوە سەرچاوەی دەگرێ،لەکۆنەوەش ڕایەکی بلاو هەبوو گوایە (پیاوی ئاینی وقەشەکان)دەبێت لەنەوەی سام بن ،سوارچاکەکانیش لەنەوەی یافپ،هەژاریش لەنەوەی حام ..(گوایە لەبنەچەدا لەعنەت لە حام کراوە )دەلێن ئەوە کۆنترین دابەشی ڕەگەزپەرستیە لەسەر بنچینەی ئاینیکە تیایدا سامیەکان وەك میلەتی هەلبژێردراو هەژمارکرابێت

---

[1602] بڕوانە : العبيد فی العراق القديم ص20

[1603] روجي غارودی- أمريكا طليعة الانهيارص18  ئەوە لە بنەماکانی بزوتنەوەیەکی ناشیۆنالیزمی ئاینی یەهودی هاتوە.

،له پروتوكولات حكماو صهيون - هاتووه: (وقد منحنا الله العبقريه كى نكون قادرين على القيام بقياده العالم)[1604]، خۆشيان بەپاكترين توخم لە مرۆڤايەتی زانيوە وژن وژنخوازيان لەگەل لايدە نەكردوە ،بۆيە ويل ديورانت دەلێت ( ..حافظوا على جنسهم، واستمسكوا به استمساكاً عجيباً. فالأسرى العبرانيون الذين نرى صورهم في النقوش المصرية والآشورية يشبهون كل الشبه يهود هذه الأيام ..)[1605]، لەبەرامبەريشدا (اللاساميه) سەرهەلدەداو لە كۆتاييدادەبتە جينۆسايدی يەهودی لەسەر دەستی نازيەكان[1606].

**ئەو ئايديۆلۆجيەی هۆلۆكۆستی بەرهـەمهينا:** هەرچـی رەگـەز پەرسـتی نەتەوايـەتی نـەژادی و شارستانيە... ئەوانە لەدوای ڕابونی نەتەوايەتی سەری هەلدا لە سـەدەكانی 18-19 لـە ئـەوروپا، ئەوانەی ڕاستەوخۆ كاريگەريان لەسەر سەرهەلدانی نازيەت ودژ بە ساميەت كۆمەلێك زاناو توێـژەری گەورە بووينە ،لەوانە: گوپێنولە كتيبی( حول عدم تساوى أجناس البشريه ) فەرەنسی، شـامپرلينی ئينگليزی، (بەواس)، (فيشەر) (هۆبز)و (هيگل) (نيتچە)(ئەرنست رينان)...جورە تەنزيرێكی ڕەگـەز پەرستی وای كردووە دەلێن دەبێ جيهان لە لايەن ئومەتی ئەلمانياو نەژادی ئاری بـەڕێوە بچـێت، دوا هەنگاوی مێژووەو ئـيتر ئاريـە وەك بـالاترين نـەژادی مرۆڤايـەتی دەبێتـە سەرمەشـق و پێشـڕەوی ميللەتانی جيهان و كۆتايی مـێژووش لـەو ئومەتـە دێـت ، (بانگێشـەی سـۆپەرمان بـە ئـەلمانی – لۆيەرمانش بۆ سامی)، لە پۆلێنی نەتەوەكانی تر ميللـەتی يـەهوود بـە نـزمترين ژمێـردرا،زاراوەی (sub-man) واتە(مادون الإنسان)،كتێبێكی فايخنجەر بەناوی (الشخصيه والجنس)باس لەوە دەكا كە چۆن بۆ دروست كردنی منداڵ تێكەلی توخمی ئافرەت لەگەل تـوخمی پيـاو دەبێتـە هـۆی لاوازی كـە سێتيەكەی ئاواش تێكەلی توخمی(نا ئاری بە تايبەتی يەهودی) دەبێتە لاوازی كەسێتی كۆمـەلگە، لە و سەردەمی لەدوای سەرهەلدانی ( تيۆری پەرەسەندنی _ داروين) و ( تيۆرەكانی سپنسر) پەيدابوونی تيۆری (داروينيەتی كۆمـەلايەتی ) گەلێ لەو پۆلێنانەی( كۆمـەلگەكانی جهان ) بە ڕوانگەی ڕەگـەزی

---

[1604] بروتوكولات حكماء صهيون—رۆتۆكۆل رقم: 5

[1605] ويل ديورانت —قصة الحضارة ص531

[1606] لە ئەلمانيا ياسايەك دەرچووبەناوی (قانون نورمينگ 1935) يەهدود لە مافی ئەلمانی بوون داڕنرا —قاموس السياسی —بۆنۆ ماريۆڤ ص207

دادەڕێژرا، دواى ساڵى 1904 (ئەلفرید بلوتز) بۆچونەکانى لەبارەى یەکێتى ئەسلى ئارى و زیرەکیان بڵاوکردەوە، لەلایەکى تر لە سەرەتاى سەدەى بیست کۆمەڵێك زاناى وەك ( شورنى 1842 – 1921) شپنگلر(1880-**1936**)..بەدیدیکى سۆشیالیستى نیشتیمانى (بە جیاکردنەوە لە سۆشیالیستى ئومەمى ) دارشترا، لەگەڵ تیۆرەکى هیگڵ و زاناکانى تر ... نازیەت زیاتر لە کاردانەوەى ئەو شکستانەى لە دواى جەنگى سى سالەى (کە بە ئاشتى ویستفالیا لەسالى 1648زکوتاى پێهات ) ،کاردانەوەى هەڵمەتەکانى ناپلیۆن و..، هیگل زۆر بە ڕۆمانسى وخەمناکى سەرەنجامە سەلبیەکانى ئەو جەنگەو ویستیفالیاى نووسى ،داخى ئەوەى خوارد کە گەلى ئەلمانیا ببوە نزیکەى1800کیان وکانتۆن و300 میرنشین ، هیگل دەیووت : مێژوو وا هاتووە لەهەر سەردەمێك لەسەر دەستى نەتەوەیەك پێشڕەوایەتى جیهان کراوە، ئەو جارە ئەو ڕابوون و تەکنیك و زانست و دادگەریەى پەیامە لە لایەن ئومەتى ئەڵمانیاو نەژادى ئارى بو جهان دوا هەنگاوى مێژووە، ئیتر ئاریە وەك باڵاترین نەژادى مرۆڤایەتى دەبێتە سەرمەشق و پێشڕەوى میللەتانى جیهان و کۆتایى مێژووش لەو ئومەتە دێت .

ئەگەر چى بسمارك لە سالى 1871 ئەو هەمو میرنشینەى کۆکردەوەو ئەلمانیاى لیدروست کرد، بەلام درەنگ بوو ، ئەوەش بووە هوى دواکەوتنى بزوتنەوەى تەکنیك وسەرمایەدارى ، لەبەر هەمان هۆ بەشى لە (مستعمرات ) کەم بوو ..، سەرەڕاى ئەوەش دیسان هەندێ لە ئومیدەکانى هیگل وزانایان وئەدیبانى ترى ئەلمانى وئارى هێنا دى ،بەلام لەشکستى ئەلمانیا لە جەنگى جیهانى یەکەم ،ئەو هەموو مەرجەخراوە سەر ئەلمانیا لە کۆنگرەى فرساى لە 28\7\1919، جارێکى تر کاردانەوەیەکى خەستى ناشیۆنالیزمى و قین لە میلەتانى ترپەیدابوو ، گەیشتنە پوختەیەك کە پاککردنەوەى ئەڵمانیا لە نەژادە خوێن پیسەکانى ترى وەك یەهوودهەم بیناى ئەلمانیاى قایمە هەم خزمەتى مرۆڤایەتیە - کە بە (اللاسامیە) ناو دەبرێ.

ئەوەش واى کرد وەك سەرەنجامیکى لۆجیکى بزوتنەوەیەکى ڕەگەزپەرستى وەك نازى لە ئەلمانیا باڵا دەست بێت ،نەك لەڕێگەى ئنقلاب و شۆڕش بەلکو لەڕێگەى پرۆسەى دیموکرایسى ،بەو مانایەى ڕایەکى گشتیشى لەگەل خۆى هێنا ، توخم و پێکهێنەرەکانى نازیش وەك فاشى بریتى بووە لە:

سەروەری نەتەوەیی وشانازی بە باپیران و پیرۆزی و بالای نیشتیمان و بەسەر دا گوتنی پالەوانیەتی کەسی یەکەم وسەرکردە، ئەوەش زیاتر خەست بوو کاتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی پەرەی گرت بەزیادەرەوی و زاراوەی ئومە بو نەتەوە بەهیزەکان بەکار هات، زاراوەکانی وەك:شوفینی لەفرنسا، فاشی لەئیتالیا، فالانژیسی لە ئسپانیا، تۆرانی لەنێو تورك وبەعسیەت لە نێو عەرەب و نازی لە ئەلمانیا ...سەری هەلدا لە قۆناغی جیاجیادا، ئەوەی ئەلمانیا جیا لە ناشیۆنالیزمی ئیتالی و فرنسی وئیسپانی ناشیۆنالیزمی ڤۆلکی بوو ، فولك گوزارش لەو پەیوەندیە ئۆرگانیکیەی نیوان هەندی میلەت وخاکەکەی وادەکات کە پەیوەندی سیاسی ویاسایی و (ئۆرگانیش)لە نیوان میلەت وخاك ودەسەلاتی سیاسی دروست ببیت(جاروایە دەگاتە رەگەزپەرستی)[1607]،میلەتی واش هەیە بەو مواسفاتە دەسەلاتی نابیت تووشی نامۆیی و رق وقینە دەبیت وەك یەهودی (فولك منبوذ) یان وەك وەسفی(برۆدۆن)بۆ یەهودی دەلێت کەلەرەق و بیتام ترین رەگەزن وئەوان بەرپرسن لە ئازاری بەشەری [1608]،بەو شێوەیە فۆلك(ئەلمانی ئاری) وفۆلکی مەنبوز(یەهودی) لە یەك وولات کۆبوونەوە وەك سەرەنجامێکی لۆجیکی هۆلۆکۆستی لێدێتەدی .

بزوتنەوەی نازی ئامانجەکانی لە 25 مادە کۆکردبۆوە ،لەوانە 1- هەلوەشاندنەوەی پەیماننامەی فرسای 2- یەکگرتنەوەی ئەو ناوچە ئەوروپیانەی کە بە ئەلمانی دەدوێن ( مستەعمەرەکان ) و زانکۆیەکی جەرمانی - کە رێکخراوێکە لە شێوەی فرانکۆفۆنیو تۆرانی وزانکۆی عەرەبی ئێستا دەیویست ئاریەکان تیا کۆ بکاتەوە، لەپێش جەنگی جیهانی یەکەم لەلایەنی رێکخراوی ( یەکێتی گشتی ئەلمانی ) بە سەرۆکایەتی ( ئەلمەرکلاسی) دروست ببوو بەناوی ( زانکۆی جەرمانی ) 3- ناسنامەی ئەلمانی نەدرێتە "غەیرە ئاری" بەتایبەتی یەهوود .. لەگەل چەند داخوازیەکی تری چاکسازی ئابوریو چینایەتی کە لەگەل بنەما دیکتاتۆریە سۆسیالیستیەکانی نیشتیمانی دەگونجا، بەو شێوە زەمینەیەکی فیکری و کەلتوری و فەرهەنگیو رەگەزی سازا بۆ پەیدابوونی پیاوێکی وەك (ئەدۆلف هیتلەر ) کە (عریف) بوو لە سوپای ئەلمانیا لە20/ ئەپریل/1889لە (پرۆناوە)دێیەکی

---

[1607] بۆ زیاتر لەو ... الموسوعە الیهود والیهودیە والصهیونیە ج1 ص24

[1608] بۆ ئەو وەسفانە بروانە : جۆرج قرم –تاریخ اوروباوبناء اسطورة الغرب ص307

نەمساویە لە دایك بووە، زۆر بە بیرۆکەی ( سۆپەرمان) ی (نیتشە) کاریگـەر بـووە، بۆیـە سـروودی ئەڵمانیش ( ئەڵمانیا لە سەرووی هەموو ) ی ساڵی 1852هیناوە مەیدان وەك سروودی نیشتیمانی.

ئەوە بەکورتی سەربردەیەکی دروست بوونی تێڕوانینی نامۆیانە بەرامبەر خەلکی تر، هەریەکە لـە :ئایدۆاۆجیای ئومەمی مارکسـی، لیبرالیـەتی ڕۆژئـاوایی، بـوونی یەهودیـەتی، .. وا لیسـتاند کـە هۆکاری شکستی ئەڵمانیا بووینە لە جەنگی جیهانی یەکەم ،بەتایبەت یەهودکە ئەویش لەلای خۆی پیێ زل تربوە لەخەلکی تروەك لەسەروو باس کرا ،زیاتر لەویش گوایە پەیمانیکیشـیان لەگـەل خـودای گەورە هەیە ،ئەوە دەقەکەیەتی : المواثیق بـين الله وبـني إسـرائيل:( العهـد الـذي قطعـه الله مـع بـني إسرائيل في حوريب، وجدد في أرض مـوآب (تـث 29: 1)، ئـەو دووپەیماننامەیـەی خـوداو میلـەتی ئیسرائیل به (بالوصايا الشعائرية القديمـة) ناوزەد دەکریێ[1609] ، ڕێك مانای دوو سەرکە بەرانەکـەی کوردیە لەیەك مەنجەل ، چاوەڕێی کارەساتی لیێدەکریێ .

نامۆیی یەهود لە مێژوودا:

توێژینەوەیەکی زۆرکراوە لەبارەی یەهود ویەهودیەکان هەندێکی بێلایەن هەندێکی بەزیادەڕەو و دەمارگیریانە ،بەتایبەتی لەلایەن عەرەبەوە لەدوای دۆزی فلستين ، بەلام بەگشتی هەندێك هۆکار هەیە تا ڕادەیەك بکەونە ژێر گومان وتووشی کیشەی گەورەببنەوە ،لەهەموی گرنگ تر ئەوان خۆیان پیێ ئومەتێکی هەلبژێردراوەوجیان لە میلەتانی ت.،لەلایەکی تریش ئاینەکەیان تەبشیری نیە بۆیە کەمایەتین ، ئەوە وای کردوە لەدۆخێکی نامۆیی وشپرزە بن، زیاتر لە 2500ساله یەهودی بەو جۆرە لیکدانەوە شازانە کاردەکەن وەك (ئەرسەرکۆستلەر)دەلێت بوویتە هۆی جۆرە سایکۆلۆجیەیەکی شاراوەو دوودیو ،برۆدۆنیش وابەسەلبیان باسیان دەکا,لەلایەك خۆبەگەورە زانين لەناخاو هەست بە کەمسەیرکردنی خەلکی تر ، ناچار بووینە لە پەیوەندیا توقیەو سفارد بەکاربهێنن ، لەوەوە زاراوەی (تطبيع اليهد) لە معجم الصهيونی هاتە کایەوە بەمانای ئاسایی کردنەوەی کۆمەلگەی یەهود

---

[1609] قاموس الكتاب المقدس - دائرة المعارف الكتابية المسيحية .

،ئەگەرچی  یەهودی بەمانای عەقیدەی یەهودی هاوتای تەوراتی ،دەلێن یەکەم جار یۆسفۆس فلاسیفۆس بەوانەی ووت یەهودی کە لە خاکی یەهوزا بوون [1610]بەلام هەر خودی (عبری) مانای نامۆو لیقەوماو داماوو دەکا، لە مێژوودا دووچاری لێقەومان ودەربەدەرو قڕکردن بووینە ، لە پیش وپاش مەسیحیش لەو دەردە بووینە ،ڕق وقینەو دەربەدەرکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوریەکان لە 724پ زئاشوریەکان یەهودیان دەرکرد،585پ ز بابلیەکان وایان کرد،139پ ز رۆمەکان,جاریکی تر 50 پ ز ،70زلە فلستین دەرکران،624 لە ئەسکندریە، 1467لە تلمسان ،لە هەندێ سەرچاوەی مێژوویی باس لە سەربدەیەکی ڕەشەکوژی ودەربەدەری یەهودیەکان دەکا لە وولاتی فارس ,بەهۆی پیلانیکیان ,دوای بوە جەژن و..[1611]دوور نیە ئەو سەربردە کەمێك پەیوەندیدار بێت بە سەربردەی نەورۆز

لە الموسوعەالیهودیەدەلی لە سالی 628ز لەسەردەمی پیغمبەر لە جزیرە دەرکران[1612] لە (موسوعەالعربیە)ش دەلێت یەهود لە میژوودا زۆرجار توشی ئەو جینوسایدە بووینە (بنو قریظ)لەسەردەمی پیغمبەر [1613]،سەرچاوەی ئەو هەوالانە دیارن بەلام پێناچی ڕاست بێت،بەشێك ئەو کوشت وبڕەی یەهودی لەسەر دەسەتی پیغەمبەریکی واپڕ بەزەیی لە بنەڕەتا ڕەتدەکەنەوە [1614] (لەبابەتیکی تر باسی دەکەین) ، مسیحیەکان بەگشتی واتیگەیشتون کە یەهودیەکان (ح مسیح)یان کوشتوە ،واتە خوداوەندی ئەوانیان کوشتوە ،هەریەهودیەکی ببینن بە بکوژەکەی دەزانن ، ئەوە بناغەیەکی(اللاسامیه) دروست دەکا[1615]، بەو تیڕوانینە لە سالی 1197ەوە لاتیرانی سێیەم

---

[1610] عبدالوهاب المسیری–موسوعه الیهودوالیهودیه والصهیونیه ج2 ص19 هەتدیکی تر وا یەهود شێ دەکەنەوە : اسم عربي مشتق ما ماده "هود "العربية بمعنى التوبة و الرجوع و الإنابة ، من هاد و هودا هو صبغ من القرآن الكريم ، اليهود اسم أعجمي جامد اخذ عن اسم يهوذا السبط الرابع لأبناء يعقوب اسرائيل .

[1611] E NCYCLOPEDIA OF WORLD HISTORY *P*136

[1612] بۆ زیاتر لەو ... الموسوعه الیهود والیهودیه والصهیونیه ج1 ص149

[1613] الموسوعه العربیه ج17 ص893

[1614] بۆ زیاتر لەو بابەتە بڕوانە: ابن قرناس-احسن القصص ص123

[1615] احمد داوداوغلو – العمق الستراتیجی (موقع ترکیا ودورها فی الساحة الدولیة )ص414

بڕیاری دەرکرد هەرمەسیحیەك تیکەلی یەهودی بیت لە کنیسە بیبەش دەکریت .بۆیە نەیانتوانی لەگوندان بژین .. ناسنامەیەکی تایبەتی خۆیان هەبیت ، تەنانەت لەگەل عەرەب یەك ڕەچەلەکن کەچی بە سەربردەیەکی تر لەگەل ئەوانیش ڕق وقینەیان دروست کردوەو دەلێن :بە پیی (سفرالتکوین) 1:23-20 ئەواحابراهیم لەکاتی مردنی سارای خیزانی پارچە زەویەکی لەزیفەی غربی ئیستای فلستین کڕیوە بۆ ناشتنی ،لە پیاویکی کڕیە بە ناوی عەفرۆن بایی 400میسقال زیو ،دوای ئەوەی ئیسرائیل دروست بوو یەکسەر مستەوتنیکیان لەسەر ئەو شوینە دروست کرد بەو بیانۆیەی ئەوان میراتگری ڕاستەقینەی مالی ح ابراهیمن چونکە: عەرەب لە نەوەی ئیسماعیلن کە دایکیان هاجەرە کەنیزە بوە کەچی یەهودیەکان لە سارانە کە ئازاد بوە نەك کەنیزە [1616]، دوایش لەگەل داگیر کردنی فلستین زیاتر خەست بۆوە .

لەسەر ئاستی ئەوروپا بەهەردوو تەوەری ئاینی وڕەگەزی دووچاری نامۆیی ببوونەوە ، هەردەم جێی گومان بووینە، لیۆن پۆلیاکۆف لە کتیبی(الیهود الگفیلی) باسیکی ووردی بارودۆخیان وولات بەوولات دەکا وهۆکاری رەگەزپەرستی ونامۆییان ،تەنانەت گەیشتۆتە زانایان وتویژەرانی وەك (برۆدۆن-شاتۆبریان-لبۆنالد-پیشووتریش:گۆپینۆی فرنسی و چامپرلینی بریتانی و..) جاروایە یهودیان بە شەیتان ناوزەد کردوە[1617]، ناپلیۆن کۆمەلیك پرسیاری لە یەهودیەکان کرد سەبارەت بە هاولاتی بوون و(پرسی توقیە) ی خۆشەویستی وولاتی فرنسی وکۆکردنەوەی لەگەل ئەو بیرباوەڕانەی یەهودیان وەك (شعب الله المختار)وڕایان بەرامبەر میلەتی فرنساو تیکەل بوونیان ومولکیان و ژن وژنخوازی ...بۆ ئەوەی کۆمەلگەیەکی مەدەنی فرنسی دروست بکا[1618]، وەلامیکی کۆتایی دەست نەکەوت ، تا وەك هاوولاتی فرنسی هەژماریان بکات وهەرلە شلەژاویدا بووینە بەتایبەتی لە ساتە جەنگی وقەیرانەکان ، لەهەمو ئەوروپائەو گومانەیان لەسەر بوو هەتا لە روسیای سەردەمی قەیسەر، وەك(لینین)باسی دەکات ودەلیّت قەیسەر ڕقو قینەی گەورەی لە

---

[1616] العمق الستراتيجى ص421 .

[1617] تاريخ اوروبا وبناء اسطورة الغرب ص306-

[1618] احمد داوداوغلو – العمق الستراتيجى (موقع تركيا ودورها فى الساحة الدولية )ص411

یەهود بوو ،لە 100 شار لێیاندراو سەرجەم 14000کوشت وبریندارییان هەبوو[1619] ،بە پێی فەرهەنگی سیاسی(ئارش) گەورەترین کوورەی سوتێنەری نازیەکان ناوی ئاتچڤیتسە لە پۆلۆنیابوو ، دوای تەواوی ئەوروپای گرتەوە بە پلەی جیاجیا بە پێی خەستی ڕەگەزی ئەو وولاتە ،لەهەمویان خەست تر لە ئەلمانیای نازیە .

**نازی و هۆلۆکۆست:** ئەوانەی سەروو زەمینەیەکی ئایدیۆلۆجی ومێژوی ڕوودانی هۆلۆکۆستە ، ئیستا دێینە سەر بڕگەیەکی تر کە نازی ڕاستەوخۆ لەدەسەلاتەو ئەو تیۆڕوانینە مێژووی وئایدیۆلۆجیە جێبەجێ دەکا ،تێکڕای ئەو هەمو بۆچوون وتیۆرانەی لەبارەی توخمی ئاری و ئەلمانیاو زیرەکیان وداهێنان ومێژووی شانازیان لەچەند مەبەست وداخوازیەکی سیاسی کۆکرابۆوە وەك مافە نەتەوەییەکانی ئەڵمانیا، لەوانە (ناسنامەی ئەڵمانی نەدرێتە "غەیرە ئاری" بەتایبەتی یەهوود )..، لەسالی 1938 تەنها 12 کورسی هەبوو ،بەرەبەرە زیادی کرد ،دوای لە ساڵی 1933بە هەڵبژاردنێکی دیموکراسیانە هیتلەرو حزبی (نازی[1620]) (288) کورسی بەدەست بهێنێ دوای بۆ 230 کورسی وبە دەنگی یەکەم دەرچێت لە پەرلەمان-ڕاینشتاخ[1621]، هیتلەر بووە (ڕاوێژکار و سەرەك وەزیرانی ) ئەڵمانیا، هەموو حزبەکانی تری هەڵوەشاندەوەو بووە خاوەنی 8 ملیۆن ئەندام، ئەو 12 ساڵەی دەسەڵاتی لە دژی دیموکراسیو ئازادیو نمونەی دڕندەیی دەسەڵاتی دیکتاتۆری و شمولی و شەڕانگێزی بووە، بەکورتی سروشت و ڕەفتارو دەسەڵاتی نازی وا پێناس کراوە ڕێبازێکی تاکیانەی لیبرالی دەوڵەتیە، دەوڵەتیش لە ژێر فەرمانی حزبێك بووە، حزبیش لە ژێر فەرمانی تاکە کەسێك بووە بە ناوی (ڤۆهر — رابەر )، کە تیایدا ( ڕاوێژکاری و سەرۆکایەتی کۆمارو وەزارەتیش) کۆکردبۆوە لە دەسەڵاتی خۆی ، سیستەمێکی ساتۆکراسی دیکتاتۆری پیادەکرد،لەو جۆرەی وەسفی(رۆبیرت مایکل-1912 پێی

---

[1619] لینین -المختارات -ج6، ص237- 262، دارالتقدم-موسکو، طبعة 1977

[1620] ئەوە حزبەکەی هیتلەرە ، وشە ( نازی ) کورتکراوەی دووبڕگەی یەکەمی ناوی پارتی کرێکاری سۆسیالیستی نەتەوەی ئەڵمانیە، Nazi–National so zialis Tishe Deutsche Arbeieer partei

[1621] بڕوانة : مذكرات تشرشل ج1ص15-16.

ووتراوه: قانون اقليه الحديدى) بۆ ديكتاتۆران كەدەلیٚ: ئەگەر دەست گۆڕی دەسەلات نەبێت ئەوا بەرەبەرە دەسەلاتی مەدەنی بۆ دەولەت قۆرخ دەكرێت،لەوێش بۆ حكومەت ، لە حوكمی زۆرايەتی وبۆ كەمايەتی ،لە كەمايەتی بۆ چەند كەسێك ،لە چەند كەسێك بۆ تاكە كەس[1622]، نمونەی ئيتحادتەرەقی زۆر نزيكی ئەو تيۆرەيە ،هەموو عوسمانی لەژير دەستی ئيتحاديەكان بوو، ئەوانيش لەژير دەستی مركز عام و ئەويش لەژير فەرمانی أنورپاشا ، هەمو ئەو جۆرە سيستەمانە ئەگەری كارەسات وجينۆسايديان لێدێتەدی، ئەو دۆخە دەخەنە نێو پەيڕەو پرۆگرام ودەستور، لە مادەی (4)حزبی سوشياليستی كريكاری ئەلمانيا- نازی هاتووە :(هاولاتی ئەلمانيا ئەوانەن كە خوينيان ئەلمانە)،كت ومت مادەی (66)ی دەستوری توركيا يە بە ئەدريسی (تورك فەتەنلەر)وادەليت، هەمان مادەی 7ی دەستوری حزبی بەعسە:المادە (7) :- الوطن العربي هو هذه البقعة من الارض التي تسكنها الامة العربية .دەستورەكانی عەرەبيش دووپاتی ئەوە دەكەنەوە بە پيدانی ناسنامەی عەرەبی بە وولاتەكەيان ،سەيری دەستوری عێراق 1968 بكەو ودوايش هەردووبارە دەبۆوە: المادة الأولى: .. الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها. دةستوری سورياش1970 و، 1973: المادة الأولى..القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي...زۆری تريش، نازيەكان بەو ئايديۆلۆجيەی سەروويان ڕوانيانە يەهودی وقەرەج وشيوعی كەمايەتی تر وەك بارگرانی وغەوارە،لە چوارچێوەی كۆمەلێك بنەماكانی نازيايەتی:

1-پاكی ئاری وناپاكی سامی كە يەهودبەشێكە لێی 2-ميلەت هەيە بۆ دەسەلات وبەڕێوەبرد دروست كراوە ميلەتی تريش بۆ خزمەت وپابەندی 3-سەرۆك لەسەرووی ياساو دەستوورە ودەسەلاتی فوولی هەيە باوەڕبوون بە هيزو جەنگ بۆ هێنانەدی ئەو بنەمايانە .

دوو ئاڕستەی تەواو پيچەوانەی دەمارگيری ڕووبەڕووی يەك بوونەوە،دەمارگيری ئاريايەتی ئەلمانياو دروشمی (ئەلمانيا لەسەرووی هەموان)،لەگەل دەمارگيری (شعب الله المختاری)يەهودی بەدروشمی(

---

[1622] Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts 226-p لە (موسوعە الميسرە) ناوی ناوە (القانون الحديدى للاوليكاركيە–iron law of oligarchy)

یەهودی لەسەرووی هەموان) ،سەرەنجامیکی لۆجیکیە کارەسات ڕوویدا،بـەڕای هیتلـەر سـەرکەوتنی ئەڵمانیا واتە سەرکەوتنی شارستانی مرۆڤایەتی و ئەوەش دەگەشـێتەوە بـۆ تـوخمی ئـاری کـە ئـەو پەیامەیان هەڵگرتووە، بەو ڕەوتە توندە ( هیتلەر ) هاتە گۆڕەپان لە دژی هـەموو جیهـان جگـە لـە ئاریەکان نەبێت، لەسەر ئاستی ناوەخۆ بەئاشکراتر دروشمیان دژ بەیەهود بەرزدەکردەوە ،لـە 1933 زۆربەی یەهودیەکانیان لەدامودەزگای دەوڵەت دەرکرد، لەکۆنگرەی حیزبی نـازی 1935 کۆمـەڵێك بڕیاری ڕەگەزی بەناوی یاسـاکانی نورمپریـدیج بـۆ ڕەچـەڵەکەکانی تـر دەرچـوو، بەتایبـەتی دژ بـە یەهود،تا گەیشتە ئاستی جینۆساید.

پالنەرو هۆکاری هۆلۆکۆست

پالنەرو هۆکاری دروست بوونی هۆلۆکۆست وقڕکردنی یەهودیەکان لە ئەلمانیا بۆ دوولای سـەرەکی دەگەڕێتەوە ،لایەکیان بارودۆخی ئەلمانیاو میـژووی شکسـتیان وئایـدیۆلۆجیای نـازی ،لای دوەمـی بارودۆخی یەهودی بوە کە خۆی پی (شعب الله المختار)ە ،جۆرە رەگەزپەرستیەکی بەئاشکرای لەگـەل میلەتانی ترهەیە ،وەك لە (تلمۆد) و(پرۆتۆکۆلات )ئەدەبیاتی تریان هاتوە ،لەلایەکی تریش کەمن لە جیهان، بە تێکڕاهۆکارەکانی سەر هەلدانی بزوتنەوەی (ئـەنتی سـامی— نـا بـۆ سـامیەت) لەلایـەن تویژەرەوان دەگەڕێتەوە بۆ : جیاوازی فەرهەنگی یەهودی ولاوازیان، بالاییان لـە جـم وجـۆلی بـازاڕو پیشەی مشەخۆری قومارو فیل وسوو و..بۆکۆمەلگەیەکی ئاسایی خۆبەخۆو لەگەل میلەتانی تـریش ، هاتنە کایەی دەمارگیری نەتەوەگـەری لـە ئەوروپالەبەرامبـەریش دەمـارگیری مخەنەتانـەی سـامی ،سەرهەلدانی هەندی تیـۆری سـۆپەرمانی ئـاری و پاشـکۆیی سـامی ،نزیـك بوونـەوەیان لـە چـەپە وشۆرشگیرەکان دژ بە دەسەلاتەکان .

ئەدولف هتلر(1945 - 1889) خۆشی لەکتیبەکەی( mine comfe ) (کفاحی)-تیکۆشانم- **لە** ساڵی 1924 لە زیندانیدا باوەڕەکانی خۆی نوسیەوە بە ستراتیژیەکی( پان ئەڵمانی ) و یادی بسمارکی و ئەزمونەکانی فاشی ئیتاڵیا و زانکۆی ئەڵمانیا،ئاریەتی و...لەوێ هەستەکانی بەرامبەر یەهود گوزارش کردوە ، دەلیٚ من واهەست دەکەم بەپاڵپشتی خوای گەورە یە ئەو

جەنگەم دژ بە یەهود ڕاگەیاندوە لە قازانجی هەمو بەشەریەتە وبەشیکە لە خۆ پاریزی ، چونکە هەرگیز ئەلمانی نەبووینە، میلەتیکی تایبەتن دەلێی یەك جەستەن ،ئاکاریان لەگەل ئەلمانی نایەتەوە زیاتر کاریگەرن بە بزوتنەوەی زایۆنی ،خۆیان پیگەورەترە لە خەلکی تر(شعب مختار) ،خەریکی بەدڕەوشتی و بازرگانی خراپ و ویرانی بناغەکانی کۆمەلگە بووینە (پرۆتۆکالیش وادەلی) ، هەرچی خراپەیە حەتمەن یەهودیەکی لە پشت بوە ، خۆیان لە ئەلمانیا 1٪ کەچی 90٪ی ئەدەبی خراپ وەبەرهەم دینن ، توقیەشیان هەیە لەسەرەوە یەکیتی دیموکراسین لە ژیرەوە شیوعین ،لەسەرەوە دژی زایۆنین لەژێرەوە یەك جەستەن، بۆیەش بۆ ئەلمانیا دوو هەڕەشەی گەورەی یەهودیەت وشیوعیەت وەك یەك دێن.

لەلایەکی تریش ئەلمانی مەسیحین ئەگەر چی نازیەکان ئاینیان نەبوو سۆشیالیستی ناشیۆنالیزمی بوون[1623] ،بەلام زەمینەی وولاتەکەیان مەسیحی بوو ،یەهودیەکانیش ئاینیان جیا بوو ، وەك مارکسیش لە کتیبەکەی (حول مساله الیهودیه) تیبینی ئەوەی کردبوو کە لەکۆتایدا ئاینی گشتیان مسیحیە واتە جێی ئاینی یەهودی نابێتەوە، لە پیشەکی کتیبەکەی مارکس(فی مسألە الیهودیە)وەلامی پرۆپاور دەداتەوە و وادەردەکەوێ یهودی لە دەولەتی مسیحی ئیمتیازی دەوێ بە هاوولاتی بوون رازی نیە (لا يستطيع اليهودي أن يبقى يهوديا في الحياة العامة للدولة إلا سفسطائيا فقط، ظاهريا).دەشی گوت ئەگەر شەمە بوە پشو مانای یەهودی نەما، ئەگەر یەکشەمەی یەهودیان بوە پشوو واتە مسیحی نەما ،چارەی مام ناوەندی نیە جگە لەتیکگیران[1624] ، مارکس پێیوابوو ئەوە دەردی هەمو ئەوروپایە جگە لە ئەمریکای سەروو کە

---

[1623] لە چەندین سەرچاوەو ووتاری تری (هتلر) دژ بە ئاینی مسیحیش بوە ،دژی تەواوی ئاین بوە ،لە یەکێ لە نزیکەکانی ئەو وەسفەی ئاینیلەلایەن هیتلەرەوە گۆتراوە : " أن الضربة الأقوى التي أصابت الإنسانية هي قيام المسيحية. المسيحية هي الطفل الغير الشرعي للبلشفية، وكلاهما من اختراع اليهود. إن الكذبة المدبَّرة فيما يختص بالدين هي ما قدمته المسيحية للعالم.. إن السبب الحقيقي في كون العالم القديم نقيًّا وصادقًا ومضيئًا هي أنهم لم يعرفوا السوطين الرئيسيين.. الطاعون والمسيحية" .

[1624] مسالة اليهودية ص 4 ، ص71.

ئاین ودەولەت لیکجیاکرایتەوە ، یان هەر دەولەت ئاینی نیە، بە پێی تویژینەوەکانی (فیلهالم رۆبك) کە لەکاتی هۆلۆکۆست بلاوی کردەوە دەلیٚ مارتن لۆتەر زۆر کاریگەری لەسەر سیاسەتی ئەلمانیا هەبوەبە ئارٍستەی ئاینی مسیحی ،خودی هیتلەر بەکتیٚبیکی مارتن لۆتەرسەرسام بوو دژبە یەهودیان بەناوی (عن الیهود واکاذیبهم) دەیگۆت ئەوانە لەنەوەی مارن..، هەر لەبنەچەدا لە نیٚوان مسیحی ویەهودی جۆرە جەنگیکی سارد هەبوو پیش ئەوەی وا ببیتە گەرم وهۆلۆکۆست مسیحیەکان یەهودبە بکوژی (مسیح)دەزانن، یەهودیەکانیش پیٚیان وابوو گەشە بە مسیحی دان دەبتە هۆی بێدینی تەواو کەچی گەشەی یەهودی لەبن نایەت وهەرجەوهەرەکەی بەهیز دەکات [1625]، ئەوانە هەموی کاریگەری لەسەر نازی هەبوە ، هیتلەر هەم بە پالنەری ئاینی و هەم هەولیداوە ئەو هەلمەتەی بۆسەر یەهودیان ڕای گشتی وەرگریٚ ،لە ڕاپۆرتیکی پۆلیسی هاتوە کە لە یەکیٚ لە گوتارەکانی هتلەر لە میونیخ-1936 بەبۆنەی سەری سال دەلیٚ ئیوە واتیمەگەن کە (ح مسیح)ئاشتی خواز بوە وەك کنیسەو پیاوانی ئاینی بانگیشەی بۆ دەکەن ،بەلکو گەورەترین شەڕکەر وموجاهید بوە دژی یەهودیان ، منیش هەمان ئەو پەیامە تەواو دەکەم هەر لە ڕاستیدا (سۆشیالیستی ناشیۆنالیزمی –نازی)بریتیە لە بەرجەستەکەری سیرەی عیسا[1626]، لە زۆر ووتاری تری پیشوو تریش ئەوەی دووبارەدەکردەوە بە جۆری جیاجیا ،لەسەر ئەو بنچینەیە لەزۆر لای دونیا ناوەندە مسیحیەکان پشتگیری کوشتاری یەهودیان کرد دژ بە (شعب الله المختار)ی یەهودی لە ئەلمانیا ،بەوانە دەووترا پۆگرۆم (لە ئەوروپاو روسیاو ئەلمانیا..)کە زۆر ڕقیان لە یەهودبوو تارادەی کوشتن[1627] ،لە ئەوروپا هەر ناوی یەهود بهاتبایە وەك کەسانی بێئەمەك ودووڕوو و قومارچی وبەرژەوەندی پەرست ناوزەد دەکران .

هۆکاری ڕاستەوخۆی هۆلۆکۆست ئەوەبوو لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم هیتلەرو نازیەکان پیٚیان وابوو شیوعیەکان ویەهودو هەندیٚ لای ترئینتمای ئەلمانیایان نیەو بەسۆز نین بۆ سەرکەوتنی ئامانجە

---

[1625] بۆ ئەو جیاوازی وتێڕوانینانە بڕوانە : **باور –مسألة اليهودية ص** 71

[1626] Friedlander- nazi garmany and jews - p102

[1627] بۆ زیاتر لەبارەی زاراوەی (پۆگرۆم) بڕوانە: الموسوعة الميسرة .. ص83

پیرۆزەکانی ئەلمانیا ،هەندێ ڕووداویش لەشێوەی بەرگری یەهودیەکان دژ بە دەسەلاتی نازی هەست پیکرا ، وەك نمونە لە پاریس لەسەر دەستی گەنجیکی یەهودی لەشەوی9/10مانگی یازدەی 1938سکرتیری بالویزخانەی ئەلمانیا تیرۆر کرد ، شکستی ئەلمانیا لە جەنگی دەریایی (گەتلاند) لەگەل بەریتانیا خرا ئەستۆی یەهودی ..زۆری تریش.

قۆناغەکانی هۆلۆکۆست

لەسەرەتا وەك ڕایەکی گشتی دژ بە یەهودو دوایش فراوانتر دژ بە (سامیایەتی)سەری هەلـدا، بـە پیی قاموسی سۆڤیەتی (ناسامیایەتی) بزوتنەوەیەکی نازیە بۆ لەبیرچوونی ململانیی چینایەتی هاتـە کایەوە ،لەسەرەتادا مافی هاوولاتی بوونی ئەلمانی لەیەهودی ستینرایەوە[1628] ، هیتلەر لەکتیبەکـەی (mine comfe)دەلێ یەهودی هەرگیز ئەلمانی نەبووینە..، لە سالی 1933 زۆربەی یەهودیـەکانیان لەدامودەزگای دەوڵەت دەرکرد، لەکۆنگرەی حیزبی نازی 1935 کۆمەڵێك بڕیاری ڕەگـەزی بـەناوی یاساکانی نورمپریدیج بۆ ڕەچەڵەکەکانی تر دەرچوو، تا ئەو ڕادەیە قەدەغـەکرا کچـی ئـاری بدرێتـە یەهودی، دوایی مافی دەنگدان و مەدەنی تریشـیان لـێ سـەندرایەوە، لـە 15/ نۆڤەمبـەر/ 1938 یاسای قەدەغەی خوێندنی قوتابی یەهودی دەرچوو، دوای (فرانزرادیماغ) (ئەدۆلف ئایخمان) و(هندریك هیملر) بەفەرمی بونە بەرپرسی دۆسیەی لەناوبردنی یەهودیەکان و دەرکردنیان لە ولات، بە تایبـەتی (هیدریتچ)ڕێك ڕۆلی (علی حسن مجید)ی بینیوە لە ئەلمانیا لەسالانی 1932 بەدواوە، ناویشـی بـە (جەلاد)ڕۆیشتبوو هەروەك علی حسن مجید لە عیراق وکوردستان ناوی بە (علی کیمیاوی) رۆیشتبوو ، لەسالی 1942 بە فەرمی بوە سەرۆکی جستاپۆ(دەزگای هەوالگری ئەلمانیا) دوای تیرۆرکرا ئـەلمانیا لە تۆلەی تیرۆرەکەی ئەو گوندانەی تیکرووخاند[1629] .

لەسەرەتادا پێشنیارکرا یەهودیەکان بنێردرێنە دورگەی مەدغەشقەر، یەکەم هەڵمەتی فراوان دژی یەهودی شەوی 19 نۆڤەمبەری 1938 بەکارهات کاتێ میللەتیان هاندا بۆ خۆپیشاندان دوکان و

---

[1628] القاموس السياسي –بۆماريۆف ص207.

[1629] بۆ زیاتر لەبارەی ( هیدریتچ) بڕوانە: القاموس السياسي – احمدعطية اللة ط3ص1368

موڵك ومالّی یەهودیەكانیان تێكشكاند، لەكاتی تیرۆر كردنی سكرتیری بالویزخانەی ئەلمانیا لە پاریس لەسەر دەستی گەنجیكی یەهودی لەشەوی 9/10 – 11-1938 دیسان لە هەمو شارەكانی ئەلمانیا بوە ڕاپەڕین وتالانی بازاڕی یەهودیەكان وهەزارانیان لیناردنە سەربازگە گیراوەكانیان ، ئەوكاتی شوشەی بلەور زۆر نایاب بوو دوكانی یەهودیەكانی خاوەنی ئەو جۆرە شوشانە بوون بۆیە ئەو شەوە ناوی نرا(شەوی بلۆر) ، ئیترحكومەت وحزب ومیلەت پێكەوە دەستیان كرد بە هەلمەتی قڕ كردنی یەهود ،سەرەتا بۆ سەربازگەكانی نازی ،هەرجۆرێكی تاوان و جۆری ڕەگەزەكەی ناوو ڕەنگی خۆی هەبوو ،بەو شێوەیەی خوارەوە :

+ ڕەنگی زەرد بۆ یەهود .

+ئەو یەهودیانەی دایكیان ئاری بوایەدوو ئالای زەرد وڕەش.

+سوور بۆ شیوعیەكان بوو .

+رەنگی مۆر بۆ ئەوانەی پێیان دەووتن(شهودیهوه).

+ ئالای ڕەش بۆ دەرگای ئەو زیندانیانەی ئافرەت ودۆم وغەجەر(لە كوردستان پێیان دەووترێ قەرەج).

+رەنگی خاكی بۆ ئەو پیاوانەی بەدڕەوشت .

+سەوز بۆ تاوانباران بەگشتی .

سەرجەم 47 سەربازگەیان بۆ كردبوونەوە ،بە خراپ ترین شێوە لەناویان دەبردن بە بەكارهینانیان بۆ تاقی كردنەوەی ژەهراوی ، بۆ پزیشكی بۆ سابون دروست كردن ،هەندیكیشیان دەختە ناو ئەو فرنیانەی كەلەبنەچەدا بۆ ئەو جۆرە نەخۆشانە دروست كرابوو كە مەترسی بوون بۆ بلاوبوونەوە .

<u>زیان ودادگایی وقەرەبۆ</u> : یەهودیەكان خۆیان پیَ پاریزراو بوو لـەوەها كارەسـاتێك بـە پێـی بـڕوای تایبەتی خۆیان ،كە گوایە هاوپەیمانیەكی تایبەتی نێوان یەهودی وخودا هەیە بۆ پاراسـتنیان (..أدرك

بنو إسرائيل أن الله خصه بضمانات شعبية سوف يحميه ويدفع عنه الخطر بمقتضاها. ..)[1630]، بەپێی ئەو میساقە نابوایە تووشی ئەو کارەساتە هۆلۆکۆستە ببونایە ، چۆن شعب الـه المختـار وای لێـدێت دەقی میساقەکە: المواثیق بین الله وبني إسرائیل:( العهد الذي قطعه الله مع بني إسرائیل في حوریـب، وجدد في أرض موآب (تث 29: 1)، وختم بالفرائض المذكورة في خر 24: 1- 8. وبالعهد السینائي أدرك بنو إسرائیل أن الله خصه بضمانات شعبیة سوف یحمیه ویدفع عنه الخطر بمقتضاها. وقد تعهـد الشعب أن یعبد یهوه وحده (خر 34: 14). وتعهـد یهـوه أن یقـود شـعبه إلى كنعـان (34: 11). وقد أصبح هذان المیثاقان فیما بعد جزءًا هما عرف "بالوصایا الشـعائریة القدیمـة" (خـر 34: 10- 26 و22: 29- 30 و23: 12 و15- 19)، ونـواة لشـریعة العهـد)[1630] .کەچـی دوای ئـەو زیانەگەورانەیان لێکەوت ، تێکڕای زیانەکانی سەرو مالی یەهودی جۆراوجۆر دیاری کـراوە ،ژمـارەی جیاجیا دیاری کراوە ، بە پیی قاموسی سـۆڤیەتی ژمـارەی کوشـتاریان دەگاتـە ملیۆنـان بیئـەوەی ژمارەکەی دیاری کردبی[1632]، هەروەها بە پێی ئامـاری نەتـەوە یـەکگرتوەکان( خـولی 60 بەنـدی 72) بە قڕکردنی 3/1ی یەهودی گوزارش کردوە[1633] ،بەزۆری6ملیـۆن دیـاری کراوە,هـەروەك لـە زاراوەی (انكارالاباده)هاتوە،بەوانە دەووترێت (انكار الاباده) کـە نـەلێی 6ملیـۆن یـەهودی لەسـەر دەستی نازی کوژراون[1634]، تائیستاش ئەو ژمارانەی زیانی هۆلۆکۆست دەمەقالی لەسەرە ،هەنـدێك گومانیان لەو ژمارەو قەبارە زیانە هەیە ،بەلام لۆبی و دەولەتی ئیسـرائیل زۆر تونـدن لـەو بارەیـەوە ،یەك لەو نمونانە بەهۆی گومان لە هۆلۆکۆست دیڤید ئێرفینگ مێژوونووسێکی تەمەن (67) سالی بەریتانیە،لەسالی 1977 کتێبێکی نووسیوە بەناوی (جەنگی هیتلەر)، گومانی لە ژمارەو قەبارەی یەهودیەکان هەیە کە لە ئەنجامی سیاسەتی (اللاسامیه) لە ئـەرووپا و ئـەلمانیا بەتایبـەتی پـەیڕەو کرا،بیروڕای وایە کە تەنها (600) جولەکەی کوشتوەو هیتلەر بە گەورەترین دۆستی جولەکە وەسـف

---

[1630] قاموس الكتاب المقدس - دائرة المعارف الكتابیة المسیحیة .

[1630] قاموس الكتاب المقدس - دائرة المعارف الكتابیة المسیحیة .

[1632] القاموس السیاسي ص207

[1633] بڕوانە دەقی بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتوەکانی رۆژی 2005/11/1 –خولی 60 ، دانیشتنی ژ:42.

[1634] د عبدالوهاب المسیری –فی الخطاب والمصطلح الصهیونی ص24 ص29

دەکات و دەڵێت: ئەگەر ئەو نەبوایە جولەکە دەوڵەتیان نەدەبوو. ، لە ڕۆژی 2006/2/20 بە سێ ساڵ فەرمانی زیندانی درا ،پێشتریش (رۆجیە غارودی) فەڕەنسی لەسەر هەمان بابەت کە لە کتێبی (اساطیر مؤسسة للصهیون) هاتبوو سزای مالی درا لە دادگا ،کەواتەهەر عەرەب نین بەشیکی میژوونووس وزاناش وادەلێن، بەشیکی تر دەلێن بوە بەلام هەر یەهودی بەتەنها نەگرتۆتەوە بەلکوکەمایەتی ونەژادە لاوازەکانیشی گرتەوە،لەوانە:دۆمی رۆمی(غەجەر)هەندێ لەسلافیەکان وشیوعی وسۆشیا لیستە کان وکۆمەلەی شهود یهوە و ئەوانەی پێیان دەووترێ (مەسەلیەکان-هاورەگەزبازی) ،نەتەوە یەکگرتوەکان بەفەرمی لەرۆژی 2005/11/1 –خولی 60 لەمادەی(3) بڕیاڕی داوە کە نابێت نکولی لە هۆلۆکۆست بکرێت وداوای یادکردنەوەی کراوە بۆ ئەوەی دووبارەنەبێتەوە دژ بەهیچ میلەتێکی تر .

لە دوای جەنگ وشکستی نازی دادگایەکی سەربازی بەناوی نویمبیرگ لە 1945/11/30 تا 1946/10/1خایاند 13قۆناغ بوو،بۆیەش لەنویمبیرگ چونکە سالی 1935 یاسای نۆرمبیرگ جاڕدرا کە تیایدامافی هاوولاتی بوونی ئەلمانی لەیەهودی ستینرایەوە،لەو دادگاییە 22 سەرکردەی نازی سزا دران ،تیکڕای قەرەبۆیەکان بە 3ملیار مارکی ئەلمانی دیاری کرا لەماوەی 12 سال بیدالە 1953 ەوە تا 1965،هەروەها بۆ هەر یەهودیەکیش مووچەیەکی بۆ ببڕێتەوە ئەگەر دووچاری زیان بووبێت لەنێوان 1933 تا کۆتایی جەنگی جیهانی دوەم چەندین بڕیاڕو ریکەوتنامەی نیودەولەتی دەرچوە دژ بە جینۆسایدوهەژمارکردنی وەك تاوانی نیودەولەتی،بڕیاڕی ژ:260ی خولی(3)ی کۆمەلەی گشتی لە 1948/12/9 لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان جاڕدرا(اتفاقية منع جريمة الإبادة الجماعية والمعاقبة عليها - 09-12-1948 معاهدات أقرت وعرضت للتوقيع وللتصديق أو للانضمام بقرار الجمعية العامة 260 ألف (د-3) المؤرخ في 9 كانون الأول /ديسمبر 1948تاريخ بدء النفاذ: 12 كانون الثاني / يناير 1951، طبقاً للمادة الثالثة عشرة) ، ،بریاری تری لە 26تشرینی دوەم 1968، بریاری دادگای لاهای رۆژی 28ئایار 1951 و..هتد.

لەسەردانیکیدا (پاپای فاتیکان) لە 2000/3/12 بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە فەرمی داوای لیبوردنی لە یەهود کرد بەهۆی ئەوەی وەك کەنیسەی کاتۆلۆلیك بێدەنگ بوو لە نازیەکان،لەسەر

ئاستی نێودەولەتی دەست کرا بە تۆمارکردنی مادەیەکی تایبەت لە دەستوری وولاتان دژ بەو جیاوازی وڕەگەزپەرستیە ، لە هەموان توند تر یەکیتی سۆڤیەت بۆ قەلاچۆی کارو کاردانەوەی نێوان دەمارگیری ئاینی یەهودی و دەمارگیری رەگەزی ئاری مادەی 123ی دەستوری سۆڤیەت دژ بە ئەفزەلیەت و جیاوازی رەگەز بەو شیوەیە دیاری کرد: دەقەکەی (ان القانون یعاقب ای تضییق مباشر او غیر مباشر للحقوق ،وکذلك اية امتیازات مباشرة او غیر مباشرة للمواطنین تبعا لانحدارهم العرقی او القومی کما یعاقب ای تبشیر بالافضلیة العرقیة او القومیة او الکراهیة والاحتقار ) .زۆربەی وولاتانی تر لە دەستورەکان بنەمای هاوولاتی بوونیان تۆمار کرد لەسەر بنچینەی هاو — وولاتی دوور لە جیاوازی ئاینی وڕەگەزی وفەرهەنگی ومەزهەبی ونەژادی و..هەتا ئەو وولاتانەی باوەڕیشیان پێنەبووبێ .

## وێکچوی هۆلۆکۆست وجینۆسایدەکانی تر

چەند نمونەیەك لەو سەدەیە کرا دژ بە ئەرمەن و کورد و یەهود و مسولمانەکانی بۆسنە و بۆرما زۆر لای وێکچوویی هەیە، لەو پرۆسەیەی ئەنفالی کوردیش ئەوا تیۆر و بۆچونی فەزلی عەرەب و قەدەغەی پێدانی ژنی عەرەب بە کورد (لەچوارچێوەی کەفائە) و دەرکردنیان و بڕیار و یاسای ڕەگەزپەرستی، چی بەسەر کورد هێنرا ئاواش بەسەر یەهود لەئەلمانیا هەردوولاشیان (حیزبی نازی و حیزبی بەعس) یەك ناسنامەی مەدرەسەیان هەبوو، هەردوو لا سۆشیالیستی نەتەوەیی بووینە، هەردوولا دژ بە ئایین بونە، لە ئەلمانیاش ئەو شێوازەی دەرکردن و پاکتاوی ڕەگەزی بەکارهاتووە، وەك کوردستان یەهودیەکان گواستراونەتەوە بۆ شوێنی تایبەتی و لەوێ بەجۆری زۆر دڕندە ئازارو ئەشکەنجە دەدران تامردن.

لە چوارچێوەی ویکچوون وکاریگەریەکانی بزووتنەوەی نازی زۆر ناوبانگی ڕۆیشت و زۆر بەی بزووتنەوەکانی نەتەوەگەری بە جۆرێك لە جۆرەکانی کاریگەری نازیەتیان پێوە دیار بووە، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە بزووتنەوە ( تۆرانیەت ) ی (پان تورکی ) -کە لەسەر دەستی ( نیکیتن ئەلب) نووسرایەوە بە (5) بەرگ —دوای بوە بزوتنەوەیەکی رەگەزپەرستی تورکی وتائیستاش کاریگەری

ماوه، دەبینین هەمان داخوازی یەکخستنی سەرتاسەری تورك زمان و بالأی نەژادی تورکی و سەروەری باب و باپیران و نیشتیمانی پان و بەرینی (تۆران )، ئەو پەیڕەوە هاوبەشە لە دەستوری تورکیا(ئەنا یاسا)ڕەنگی داوەتەوە لە مادەکانی(1-5)هەروەها(64-68)دەقاودەق خوردکراوەی مادەی (4)ی‌بەرنامەی حزبی نازیە کەواهاتوە:لیس من المواطن الامن کان من ملتنا-valksgenoss-ولیس من ملتنا الا من کان دمة المانیة بغض النظر عن طائفتة ،اذ لیس لأی یهودی ان یکون من ملتنا[1635]،..ئەوە لە دەستوری (حزبی بەعسیش)ڕەنگی دابۆوە، بەهەمان شێوە دروشمەکانی ( پان عەرەبی) لەلایەن عەرەبە نەتەوە گەریەان،وەك لە بڕگەی (3) مادەی(1)ی دەستوری حزبی بەعس دەلێت:( الوطن العربي للعرب، ولهم وحدهم حق التصرف بشؤونه وثرواته وتوجیه مقدراته) ئەوە هەمان دروشمی نازیە(ئەلمان بۆ ئەلمانیەکان ) .

بۆ زیاتر بگەڕێوە (خالە وێکچوەکانی قڕکردنی میلەتان) لە بابەتی (ئەنفال) لەو مەوسوعەیە بلاو کرایتەوە .

[1635] بروانە: الارهاب السیاسی ص134

**(58)**

## مارکسی **المارکسیه** Marxism

**هەرەیەك لە (شوعیەت، سۆشیالیستی زانستی،پرۆلیتاریا،برجوازی، حەتمی میژوویی ، بیرۆسترۆیکاو گلاسنۆست ، ..) دەگرێتەوە**

بەهەموو ئەو کەس و لایەن و دەزگا سیاسیانە دەگوترێ مارکسی کە پەیڕەوی بۆچونەکانی کارڵ مارکس بە هاوکاری فریدریك ئەنجلس دەکەن ، لینینیش وەك گەورەترین موتەبیقی ئەورێبازو فلسفەیە بوە،بۆیە جاریش وایە (مارکسی- لینینی)یشی پیێ دەووترێ یان (مدرسەی شیوعیەت)، کەسایەتی وسەرکردە و موفەکیرە ناودارەکانیان بریتین لە: ماوتسی تۆنگ، ستالین، کیم ئیل سۆنگ، خرۆتچۆڤ،:ترۆتسکی ، جۆرج بلیخاتۆف، جۆرج پۆلینزیر، رۆچی گارودی (پاشان مسوڵمان بو) ..، لەجیهانی ئیسلامی ( ئەنوەر خۆجە، خالد بەکداش، نورالدین کیانوری ..) لەنێو کورد :عەزیز محەمەد، مام جەلال، کەریم ئەحمەد، جمال حیدەری، محمدی مهتدی ،عبدالله ئۆجەلان...، زۆربەی ئەوانەی کورد ئێستا بۆچونیان گۆڕاوە.

ئەگەر چی مارکسیەت لە چالاکیدا بوو بەلام لەدوای بەیانێك (کە بە مانیفیست بەناوبانگە)لە 1848دەرچوو جاڕی مارکسیەت(شیوعیەت) درا،کە پێکهاتوە لە کورتەی کارو ئامانجەکانیان لەسەر هەر سێ ئاستی فلسفی وسیاسی و زانستی ،یەکەم پێگەی پیادەکردنی لە روسیا بوو لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەسالی 1917ودوایش بوە یەکیتی سۆڤیەت ، لەدوای جەنگی جیهانی دوەم گەیشتە ترۆك ، لەکۆتاییی سەدەی بیستەم یەکیتی سۆڤیەت هەلوەشایەوەو مارکسیەت زۆر لاواز بوە ،بەلام لەهەمو شوێنیك ماون .

**سەربردەی مارکسیەت**

کارل مارکس (1817-1883) هاوڕێی فکری انجلس (1820- 1890)، پێکەوە کۆمەڵە تیۆرێکی ئابووری سیاسی کۆمەڵایەتی بە بناغەیەکی فکری فلسفی مادی توند دارشت، تیایدا مژدەی داڕوخانی سەرمایەداری دا لەسەردەستی چینی کرێکاران(پرۆلیتاریا) ، هاتنی بەهەشتی شیوعیەتی بێ (دەوڵەت و پۆلیس و یاسا و خێزان و موڵکیەت...) جارڕدا، یەکەم کەس و ووڵات کە پەیڕەوی ئەو ڕێبازەی کرد لەئاسمانی تیۆریەوە هێنایە سەر زەمینی کارپێکردن لینین( 1870- 1924) بووبە هۆی شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 لەڕووسیا، بەو شێوەیە ئەو ڕێبازە ناوی لێنرا (مارکسی- لینینی) ،قۆناغی واری جێبەجێ کردنی بە خێرایی دەست پێکرد، واپێدەچوو فەلسەفە و فیکری مارکسیزمیش وەك ئەزمونەکانی (کانت و دیکارت و هۆبز و هیگل و..) بەبێ پەیڕەوکردن بما بوایە ئەگەر کەسێکی وەك لینین ئەو ئایدۆلۆژیایەی وەرنەگرتبایە، لینین لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری دەستی کرد بە پڕاکتیزە کردنی بیری مارکسیزم، یەکێتی سۆڤیەتی لە 1922/12/30 دروست کردلە 15 کۆمار:(ڕوسیا، ئۆکرانیە، کازاخستان، ئۆزباکستان، ڕوسیایسپی، جۆرجیا، لتوانیە، ئازەربێجان، مالدڤیە، تاجکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستونیە، قیرغیزستان ) ، لە گەڵ هەندێ هەرێمی خود موختاریش بەناوی ( یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالیستی - إتحاد جمهوريات الإشتراكيه السوفيتيه)، ناوی نەتەوەیی بە ڕوسی ( سویز سۆڤیتك سوسیالیستی سیکخ ریبدبیك)، لەبنەچەدا ( سۆڤیەت ) وشەیەکی ڕووسیە بەمانای ( ئەنجومەن ) یان ( شورا )، خاکەکەی 6ملیون میل دوجا (22ملیون کم$^2$) ولە 16٪ ی جیهانە، پێکهاتبوو لە 120نەتەوە .

لەدوای ئەو هەنگاوە خەریك مارکسیەت تەواوی ولاتانی سەرمایەداریش هەلۆەشێنێ بەلام کۆمەڵێك شکست ڕووی تێکردکە لەدوای باسی دەکەین.

**مارکسیەتیش کاریگەر بوو بە ئەزمونی پێشی خۆی:** لە فلسفە کاریگەری فلسفەی ئەلمانی (هیگل و فیۆرباخ)، لە فلسفەی مادی کاریگەر بوو بە فلسفەی کلاسیکی فرنسی ،لە سیستەمی ئابوریش کاریگەر بوو بە سیستەمی کلاسیکی بەریتانی (ریکاردۆ وئادەم سمسیس)کە سیاسەت وئابووریان پێکەوە بەستەوە ،مارکس پێیوابوو سامانی برجوازیەکان دزیە ،(سان جیرۆم)ی پاپای نەساریەکان لە

420 ز ووتویەتی دەولەمەندی دزیە یان خۆی یان باپیرانی کردوویەتی[1636]، ڕایەکانی ئەو زاناو فەیلەسوفانەش(کە بوە هۆی سەرهەلدانی مارکسیەت)کاریگەربوون بە : ڕای ئەدمۆند بیرك (1870 ) لە بارەی( گۆڕانی کۆمەڵ بەپێی پێویستیەکانی ) ، ڕای (سان سیمۆن (1760- 1825)بە (گۆڕانی کۆمەڵ بەپێی گۆڕانی موڵکیەت) ، ڕای بیریارەکانی شۆڕشی پێشەسازی کە زۆربەی داوای نەهێشتنی موڵکیەی تایبەتیان دەکرد ، ئۆگست پلانك (1805- 1881): پێشبینی داڕمانی برجوازیەت و هاتنی پرۆلیتاریای کرد ، هەریەکە لە کتێبەکانی (هۆلباخ- نظام الطبیعة)، (مۆرگان- المجتمع القدیم)، و تیۆری پەرەسەندن و (مبدأ لافوازیە)ی کیمیا کاریگەریەکی مەزنیان لەسەر فکری مارکسی هەبوو. بەو شێوەیە فەلسەفەکەی (وەك مارکس خۆی) لەسەر سێ پێچکە وەستاوە:

1- تیۆری پەرەسەندن.2- گەردوونی بێسنوور.3- مادیەتی بوونەوەر . (لینین)یش لەکتێبی (مارکس والمارکسیە) لەو وەسفەدا دەلێ مارکسیەت میراتگری 3 مەدرەسە بوو:

1- فەلسەفەی کلاسیکی ئەلمانی (فیورباخ- هیگل)ە.

2- ئابووری کلاسیکی ئینگلیزی (ریکاردۆ- ئادم سمیپ).

4-سۆشیالیستی کلاسیکی فەڕەنسی.

جۆرج پۆلیتزریش دەلیت مارکسیةت لة 3 سةرضاوةی بنضینةیي ثیکهاتوة : (النزعة المادیة الجدلیة، النزعة المادیة التاریخیة، الاشتراکیة العلمیة)[1637].. لیکدانەوەی دیاردە سروشتی وکۆمەلایەتی و ژیانیش لای مارکسیەت بەهۆی بنەمای " ناکۆکی" یە ،دەلی ناکۆکی هەر کۆمەڵ ناجولێنێ، بەڵکو سروشتیش دەجولێنێ و گەشەی پێ دەخا بەهۆی سێ یاسای دیالکتیکی:1- یاسای ناکۆکی.2- یاسای وەرچەرخانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی. 3- یاسای (نفی النفی)، ئەوە تەفسیری بوونەوەرو ئادەمیزادە، ئیتر (وەك ئەنجلس دەلێت) پێویست ناکات بیر لەهیچ لیکدانەوەیەکی نامۆو(اضافة غریبة) و (خالق) (ئاین) بکەیەوە، دەشلێن بیرۆکەی خوداو

---

[1636] بۆ زیاتر لەبارەی ئەو جۆرە بۆچونانەی (سان جیرۆم)بڕوانة : محمدفرید وجدی –دائرة معارف الإسلامیة ج5ص382

[1637] ج بۆلیتزر- اصول فلسفه المارکسیه –الدرس14 ص260 .

هەمو ئەو جۆرە بیرە لە نەزانینی تەفسیری دیاردە سروشتیەکان هاتووە، بۆیە ووتی ئاین لە خزمەتی چینی دەسەڵاتدایە، بە گوفتەیەکی بەناوبانگ (ئاین تلیاکی گەلان- الدین افیون الشعوب) لەلای مارکس هات[1638]، لە پێش ئەویش بارون دولباخ ووتبوی ئاین هونەری سڕکردنی میللەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەکەن[1639] .

دروست بوونی ژیرخان وسەرخانی جم وجۆلی بەشەری و بزوتنەوەی میژوو .. لای مارکس ودوایش تیۆرە سیاسیەکان و تەواوی فلسفەکەی لە ووردبوونەوە لە دیاردەیەکی سادە هات ،هەر پەلە جم وجۆلەکی کۆمەلایەتی وەربگرتبایە لە هەر بازنەیەکی ڕەمەکی کۆمەلگە یەك سەرەنجامی بۆ دەردەچوو ، دەیبینی کریکارو خاوەن کارو دەرەبەگ و فەرمانبەرو بایسکیل سوارو سوالکەرو جووتیارو وقەشەوزانای ئەکادیمی وسیاسەتمەدارو .. هەرهەموی لەیەك مەبەست لە جولەدان، ئەویش ئەوەبوو بەمەبەستی پەیدا کردنی ژیان دەجولان ، سەرنجەکانی مارکس لەوە دەستی پێکرد بینی ئەو خەڵکەی دەوروبەری لە جم وجۆڵ و سەردان و کۆبوونەوەو سیاسەت کردن و دۆزینەوەی زانستیەکان و ناکۆکی و شین و شای و هونەر تا دەگاتە ئینجیل خوێندن هەمووی مەبەستە شاردراوەکەی مادەیە ،لەسەر ئەو بنچینەیە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵایەتی لە بیروباوەڕ و دەزگا سیاسیەکان و زانست و هونەر و ئاین و تەبیعات و ڕەوشت هەمووی دا پاڵ مادی ئابووری ، ناویشی نا ژێر خان ،ئەوانەی تریش سەرخانن کە ڕەنگدانەوەی ئەو ژێرخانە مادی و ئابوریە یە، بەو شیوەیە ئابووری کردە ژیرخان وباقی توخمەکانی تری (سیاسەت و فکرە فلسفەو یاساو ئینتماو زانست وئاین..)ی کردە سەرخان ، واتە ئابووری بوە فاکتەری یەکلاکەرەوە لە کۆمەلگەو پیشی وابوو میژووش وا هاتوە ، ئەو ئابووریەش خۆی لە چوارچیوەی ناکۆکی چینایەتی دەنواند ، لەکۆتاییدا دوو چینی دژ بەیەك دروست دەکا. مێژووش هەروا هاتووە بە هوی ناکۆکی نێوان ئەو دوو چینە سەرەکیە کەلە قۆناغەکانی مێژووی تا ئیستا وا گوزارش کراوە وبریتین لە :

---

[1638].دەقی ووتەکەی مارکس لە کتیبی(نحو نقد لفلسفه الحق الهیجلیه– 1844م) وانوسراوە: إن الهم الدینی هو فی الوقت نفسه تعبیر عن هم واقعی واحتجاج علی هم واقعی . إن الدین هو ێهه الخلیقه المچگهده ، هو قلب عالم لا قلب لـه ، مپلما هو روح وچع بلا روح . إنه أفیون الشعب .

[1639]روجیه غارودی –مارکسیه قرن عشرین ت:نزیه الحکیم ص143

1- مشاعی (بیٚچین) بۆ 2- بەندایەتی (خاوەن و بەندە) بۆ3- دەرەبەگی (ئاغاو جووتیار) بۆ 4- سەرمایەداری (کریٚکار و بەرجوازی) بۆ 5- سۆشیالیستی زانستی بۆ (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری برجوازی 6- شیوعیەت (بیٚچین). پیشی وابوو ئەو گۆڕانکاریانە ناچارین وهەرچەندە ڕێی لیبگیریٚ هەردەبیٚ ببیٚ ، بەو شیٚوەیە داڕووخانی سەرمایەداری وهاتنی شیوعیەت بە (حەتمی)لیکدایەوەو پیٚی ووترا (حتمیه التاریخیه) .

تیۆری سیاسی شۆڕشگیٚڕیەکەی لیٚرە دیٚت کە حزبە شیوعی و بزوتنەوە کریکاریەکان (خیرایی) ئەو (حەتمیە) زیاد بکەن، یان بە شیوە ئابوری وژیٚرخانەی مارکسی ئەوا(هیٚزی بەرهەم هیٚنەر) جەوهەرەکەی کریٚکارە و شۆڕشگیٚڕەو هەردەم لەگەشەدایە، پیٚوەندی بەرهەم هیٚنەرەکەش پەیوەندیەکی کۆنی سەرمایەداریە ، دەکەویتە سەر قەبارەی زیدە بایی[1640]، لە ئەنجامی نەگونجانیان بە حەتمی دەبیٚت بگۆڕیٚت تا بگونجیٚ لەگەڵ هیٚزی بەرهەم هیٚنەر ، ڕەنگ دەداتەوە سەرخان و دەبتە شۆڕشیٚکی کۆمەڵایەتی سەرانسەری، ئەوەش دەبیٚتە هۆی نەمانی سەرمایەداری وچینایەتی و هاتنی شیوعیەت، کە ناوی نراوە (الحتمیه التاریخیه)، دەوری دروستبوونی حزبە شیوعیەکان بریتیە لە خیٚراکردنی ووشیاریکریٚکارو دروشمی ناوەندی (ئەی کریٚکارانی جیهان یەکگرن)[1641]لیٚرەوە هاتووە کەلە بەیانیٚکی هاوبەشی مارکس وئەنجلس لە سالی 1848هاتوە بەناوی (مانیفیستی حزبی شیوعی)،وەك لینین دەلیٚت ئەوان بە دروشمی (هەمو خەلك بران رازی نەبوون)دروشمی ئەی کریکارانی جیهان یەکگرنیان هیٚنا جیٚی :(کان یسود الشعار(جمیع الناس اخوە) پم تحول الی (یا عمال العالم اتحدوا)[1642]، پیٚشبینیان کرد یەکەم گلٚپەی شۆڕشی شیوعیەت لە وولاٚتی پیٚشەسازیەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئەلٚمانیا بیٚت[1643]، بەلام زیاتر لە وولاتانی تر هاتە کایەوە ،جگە لە سۆڤیەت زۆربەی

---

[1640] زیدە بایی (قیمة الفائضة ) گرنگ ترین بەشی مارکسیە لە تیۆرە ئابووریەکان کە لە کتیبی (الرأسمال)دیاری کردوە ،زانایانی ئابووری پیٚیان وایە ئەو بەشەی رەهەندە ئەکادیمیەکەی مارکسیەت پیك دەهینیت .

**[1641]بە پیٚ ی هەندی سەرچاوە یەکەم جار دروشمی (ئەی موسلمانانی جیهان یەکگرن) لە لایەن (زانکوی ئیسلامی ) هاتووە لەکوتای سەدەی – 19– (بروانە : الاسلام والعلمانیه واپرهما فی نشأە الدوله العراقیه الحدیپە–دانەر )**

[1642]– لینین –المختارات ج1 ص542

[1643]ئەو کتیبانەی خوارەوە بە کتیبە داکانەکانی مارکسیەت هەژمار دەکریٚت :

وولاتانی تر لەڕێی بزوتنەوەی رزگاری خواز دروست بوو ،لە جیهانی سێیەم نەك یەکەم،هەندیکیشیان لە چوارچێوەی بەهیزی سۆڤیەت دروست بوون ، بەو شێوەیە شیوعیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی لەجیهان دروست بوو، بووە پرۆژەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی سیاسی و فکری و فلسفی و زانستی و سایکۆلۆژی و عەسکەری و دەولی زۆر زەبەلاح، نەخشەی سیاسی جیهانی گۆڕی، سەدان هەزار کتێبی لەسەرنوسراوە، کارێکی یەکجار زۆریشی لەسەر هەموو حزبە عەلمانیەکانی جیهان هەبوو، لە کوردستانیش ئەو ئاسەوارەی زیاتر بوو لە قۆناغی نوێیدا، لە سەرانسەری کوردستان بەدەیان حزبی مارکس و نیمچە مارکسی لێ دروست بوو، سەرەڕای حزبە شیوعیەکانی ڕەسمی، کە لە هەر پارچەیەك سنوورەکەی (کوردستانی) نەبوو، بە پالپشت بەو مەبدەئەی کە لە (بەیانی شیوعی) هاتبوو دەڵێ: (کرێکاران نیشتمانیان نیە).

## گرنگ ترین هەلوێستە سیاسی وفکریەکانی :

زۆر بەدەگمەن فکریکی تر هەبیت وەك مارکسی ئاوا توانیبێ لە هەمو ڕوەکان هەلویست وبۆچوونیان هەبووبێ و وەلامی پرسیارەکانی بە پێی هەماهەنگی فلسفی دابێتەوە ،هەندیکی لە

---

1- مارکس: رأسمال، بؤس الفلسفة،بۆ تیۆرة ئابووریەکان

2- انجلس: دیالیکتیك الطبیعة، انتی دوهرنك، بۆ فلسفەی گەشەو ناکۆکی(أصل العائلة والملكية الخاصة والدولة ) بۆگەشەی کۆمەلگە لە کۆمەلگەی سەرەتایی بۆ کۆمەلگەی بەندایەتی ودەربەگی..

3- لینین: الدولة والثورة، المؤلفات كاملة، ما العمل ؟..

4- ماوتسی تونك: في التناقض، في الممارسة العملية.

5- ستالین: المادیة الدیالیکتیکیة والمادیة التأریخیة.

6- جورج ثؤلیتزر: اصول الفلسفة المارکسیة.

7- رؤجیة غارودی: مارکسیة القرن عشرین، منعطف الاشتراکیة الکبیر.

8- تروتسکی: الثورة الدائمة.

9- مجموعة علماء السوفیت: عرض موجز للمادیة الدیالیکتیة، المادیة التأریخیة، أسس المارکسیة- اللینینیة...

سەروو باس کراو ئەوانەشی باس نەکراوەو گرنگن لەخواروو زۆر بەکورتی وگوشراوی باسیان دەکەین :

**لەبارەی گەردوون :** فلسفەی مارکسی داکۆکیەکی زۆر توندی لە (کون الساکن) دەکرد و(لانهائیە العالم ووحدتە)ئەدریسی هەرەگەورەی مادیەی دیالکتیکی بوو، بەوەش نەوەستا گورزێکی زۆر گەورەشی لەمیتافیزیکی بونەوەرو کارگێڕیەکەی دا بەوەی کە جاڕیاندا ئەو بوونەوەرە بریتی نیە لەکارگێڕیەکی بە سیستەم ورژێم بەلکو ناکۆکی وبێ سەروبەری لەسەرتاسەریدایە ، پیشی وابوە هەرهەبوەو هەر دەمێنێ وکەسیش دروستی نەکردوە ،چالاکی سروشتیش بە پێی یاسای یەکەمی مادیەی دیالکتیك دەگوزەرێ کە بریتیە لە (یاسای یەکێتی وناکۆکیەکان) .

**لەبارەی ئاین :** پێیان وایە ئاین لەلای خوا نەهاتوە بەلکو عەقلی داماو خواو ئاینی دروست کردوە ،بۆیە ئاساییە لەسەرەتادا ئاینی سروشتی وفرە ئاینی هاتبێت و دوایش ئاینی روحی ، هەر بۆیەش چەکێکە لەدەست زۆردار بۆ بەنج کردنی هەژارو میلەتانی ژێردەستە بەکارهاتوە ، توخمیکە لەسەرخانی ئابووری وکۆمەلایەتی لە قۆناغی شیوعیەت ولەگەل نەمانی مولکیەی تایبەتی ئاینیش نامینیت .

**لە بارەی عقل** : پێیان وایە عەقل گرنگە بەلام لەدوا جار بەدیلی بازاڕو چینایەتی دەیبەستنەوە وەك ئەنجلس دەلێ بۆ ناسینی هەر کەسێك تەماشای سەروکەلەی مەکە بەلکو تەماشای بازاڕەکەی بکە ، هەر بۆیەش سەرچاوەی گەشەی کۆمەلگە نادەنە عەقل بەلکو دەدەنە ژێرخان وپیویستیە ئابووریەکان ، تەنانەت دان بە جولەی فکرو عەقلیش ناهێنن ، بەلکو دەلێن عەقل بریتیە لە ڕەنگدانەوەی واقیع ،بە پێچەوانەی هیگل کە دیالکتیکی بزوتنەوەی عەقلی داڕشت بە هۆی سێ کوچکەی (هیگلی: بابەت-دژی —پیکهاتەیەکی سەرووی هەردووکیان) مارکس ووتی ئەو تیڕوانینەی هیگل لەسەر سەر دەڕۆیشت ئیمە وەرمان گێڕا سەر پێی خۆی بەوەی کە عەقل هیزی گەشەی تێدا نیە بەلکو لە واقعی مادی وەری دەگرێت .

**لەبارەی دەولەت** : پێیان وایە دەولەت لە قۆناغەکانی درەنگی گەشەی کۆمەلایەتی پەیدا بوەلە چوارچێوەی پێویستیەکانی ناکۆکی چینایەتی ،هەردەم نوینەری چینی دەسەلاتە دژ بەچینی خواروو ،بریتیە لەدەزگای داپلۆسین ،لەسەردەمی شیوعیەت نامینیت نەك بە بڕیارو ڕێککەوتن ،بەلکو پیویست پێی نامێنێ و خۆی هەلدەوەشیتەوە .

**له بارەی مێژوو وشۆڕش:** پێیان وایە ئابووری مێژوو دەجولێنێ ،گەدەش مرۆڤ دەجولێنی ،چۆنیەتی بەرجەستە بوونیشی بەو شێوەیەی خوارەوەیە: هێزەکانی بەرهەم هێنان (ئامراز+مرۆڤ) لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان (کە بریتیە لەو پەیوەندیە جیاجیانەی نێوان کۆمەڵ لە ئەنجامی پێویستی بەرهەم هێنان پەیدا دەبێ)، لە ناکۆکی دان، لە کاتێکا وەك یاسا هێزی بەرهەم هێنان گەشە دەکا، پەیوەندیەکانیشی رێگریەتی، تا دەگاتە رادەیەك ( ئەو خالە پێی دەووترێ critied) گەشەکە دەوەستێنێ، بەو شێوەیە ئەو پەیوەندیەی بەرهەم هێنانی کلاسیکی بەناچاری دەتەقێ و بەتوندی ژێرخانەکەی دەگۆڕێ و دەبتە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەری تیایدا پەیوەندیەکانی سەرخانیش بەدوا دەگۆڕێ لە زانست و سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفە و سیستەمی کۆمەڵایەتی و.. هەرە دواییەکەی ئاینیشە دەگۆڕێ[1644]،بەو شێوەیە داینەمۆی مێژوو دروست دەبێت .

**لەبارەی چاکسازی :** ئەگەر چی زۆرترین دەمەتەقێی مارکسیەکان خۆبەخۆ لەبارەی (چاکسازی) بوە،یەکتریان تاوان بارکردوە، لە کۆتاییدا (چاکسازی) بە گەورەترین دوژمنی مارکسیزم حسابە، هەروەك لە ئامۆژگاریە بەناوبانگەکەی (مارکس) بۆ شیوعیەکان هاتووە (ئێوە شۆڕشگێڕ بن نەك چاکساز)،کەچی نەیان توانیە دەست بەرداری بن ،لینین لەتویژینەوەیەکیدا بە ناوی(الماركسيه والإصلاح) دەلێ: (خلافا للفوضويين، يعترف الماركسيون بالنضال من أجل الإصلاحات، أي من أجل تحسينات في أوضاع الكادحين تترك السلطة، كما من قبل، في يد الطبقة السائدة ولكن الماركسيين يخوضون في الوقت نفسه نضالا في منتهى الحزم ضد الإصلاحيين الذين يحدون، بواسطة الإصلاحات، مباشرة أو بصورة غير مباشرة)[1645] ،هەر ئەو ناکۆکیە بوە لێك جیابوونەوەی مارکسی لەگەل سۆشیال دیموکراسی، مارکسیەکان پێیان وایە چاکسازی (حتميه التأريخيه) دوا دەخاو سۆشیالەکانیش باوەڕیان بەچاکسازی هەیە بۆ دادگەری وچارەی کێشەکان، زۆر بەتوندی دژی سۆشیال دیموکراسی و بە مونافیقی چەپی هەژماردەکەن .

---

[1644] ئەو نموونە زۆربەی سەرانی شیوعیەت (مارکس، ئەنجلس، لینین، ترۆتسکی، بلینحانۆف، ستالین، ماو، کیم ئیل سونگ، جۆرج پۆلیتزر،.. ) نەقلیان کردووە.

[1645] ئەو تویژینەوە لە ( برافدا ترودا- العدد2. 12 شتنبر 1913) بلاو کرایەوە ،دوای لە : مختارات لينين المجلد 24 ص 1 – 4 ریکخراوە .

**له بارەی دیموكراسی :** پێیان وایە داهینانیكی برجوازیە بەهەمو نیشانەكانیەوە (هەلبژاردن –ئازادی – دەست گۆڕی دەسەلات..) لە خزمەتی دەولەمەندو پێیان وایە دیموكراسی راستەقینە دیكتاتۆری پرۆلیتاریە كە مانای دیموكراسی میلیە[1646]،دیموكراسی زۆرایەتی پرۆلیتاریا بەرامبەر كەمایەتی برجوازی ، دوایش ناونرا دیموكراسی ناوەندی ، جۆری حوكمی پارتۆكراسی پەیڕەو كراوە ،بەو سیستەمانە ووتراوە كە حزب زالە ،زیاتر لەسەردەمی تاك حزب وحزبی سەركردەی كۆمەنیستەكان هاتە كایەوە .

**لەبارەی شێوازی دەولەت:** دژی لێكجیاكردنەوەی 3 دەسەلاتەكەSeparation of Power بوەو دەلێ: لۆك یەكەم جار پیشنیاری كردو مۆمتیسیكۆ گەشەی پێدا ،ئەوەش بنچینەی ئایدیۆلۆجی برجوازی پیكدەهێنی،بۆبناغەی دەسەلاتیكی هاوبەشی بورجوازی وئەرستۆكراسی،بۆ ئەوەی دەسەلاتی تەنفیزی زیاتر دەستكراوەی ڕەها بێت .

**لەبارەی تیرۆر:** بۆ هینانەدی شیوعیەت هەمو ئامرازیك گراوەتە بەرو ڕەوایەتی پێدراوە ، تەنانەت لەگەل هاوڕێكانیان ،وەك مدرسە تەواو باوەڕیان بەیەك لاكردنەوەی فكری و سیاسی هەبووە لە ڕێی تیرۆر، واتە پەیڕەوی ئیرهابی سیاسیان كردووە وەك بنەمایەكی ڕەسەنی شیوعیەت نەك تەنها ڕەفتاری شیوعیەكان، ئەنجلس كتێبێكی هەیە بە ناوی (دور العنف فی التاریخ)، ماركس ئامۆژگاریەكی بە ناوبانگی هەیە بۆ شیوعیەكان و دەلێ(توندو و شۆڕشگێڕ بن) واتە تۆقێنەر و ئیرهابی بن وەك (لینین) ڕوون تر لە كتێبی (بم نبداَ) دەلێ: (نحن مبدئیا لم ننكر الارهاب یوما ولیس في وسعنا أن ننكره. فهو عمل من العمال العسكریة یمكنه أن یكون صالحا تماما وحتى ضروریا في لحظة معینة من القتال)[1647]، لە پەیڕەویشا وابوون هەتا بۆ هاوڕێكانیان، هەریەكە لە ترۆتسكی

---

[1646] لینین لە كتیبەكەی (الدولة والثورة) دەلێت: ... وعلى ذلك نرى أن الديموقراطية في المجتمع الرأسمالي هي ديموقراطيـة بـتراء، حقيرة، زائفة، هي ديموقراطية للأغنياء وحدهم، للأقلية. أمّا ديكتاتوريةالبروليتاريا، مرحلة الانتقال إلى الشـيوعية، فهـي تعطـي لأول مرة الديموقراطية للشعب،للأكثرية، بمحاذاة القمع الضروري للأقلية، للمستثمِرين. والشـيوعية وحـدها هـي التيتسـتطيع أن تعطي الديموقراطية كاملة حقا، وبمقدار ما تتكامل بمقدار ما تزول الحاجةإليها فتضمحل من نفسها .

[1647] لينين –بم نبدأ -كتب في أيار (مايو) 1901 صدر في أيار 1901 في جريدة «اليسكرا»، العدد 4 .

وزینۆفیف وکامینیۆف وریکۆف وبۆخارین و له 1936-1937 فەرمانی تیربارانیان بۆ دەرچوو بەهۆی معارەزە بوونیان لەدادگای مۆسکۆ دوای ترۆتسکی تیرۆر کرا.

**لەبارە خانوادەو مولکیەت** : پیێیان وایە مولکیەت وخانوادەو دەولەت یەك سەرچاوەی پەیدابوونی هەبوەو هەیە ، هەمو دەردەکانیش بۆ بوونی مولکیەی تایبەتی دەگێڕنەوە ، بۆیە لە شیوعیەت مولکیەت نامێنێ جاریکی تر هەرچی لەسەر مولکیەت بینا کراوە هەموی نامێنێ .-(ئەنجلس) لەکتیبی (اصل العائلە ...) لەقوناغی شیوعیەت دەلیت (.. هەرچیەکی بنیات نراوە لەسەر مولکیەتی تایبەتی نامێنێت)[1648]،بەو شێوەیە هەروەك چۆن لەشیوعیەت دەولەت وياساو پۆلیس نامینێ ئاواش مولکیەت وخانوادە نامێنێ ،وەك لینین باسی قۆناغی شیوعیەتی بێ دەوڵەت دەكا و دەڵێ: (بۆ هەر کێشەیەکیش کە پەیدا دەبێ لە جیاتی دەوڵەت و پۆلیس و دادگا یەکسەر خەڵکی خۆیان پێی هەڵدەستن بۆ چارەسەری هەروەك ئێستا چۆن دەبینین خەڵك دوو شەڕکەر لێك دەکاتەوە یان نایەڵن دەست درێژی بکرێتە سەر ئافرەت)[1649]،

**لەبارەی نەتەوەیی و مافی چارەنوسەوە :** بەگشتی باوەڕیان بە ئایدیۆلۆجیای نەتەوەیی نەبوە ،لەجیاتی پەیڕەوی ئایدیۆلۆجیای ئومەمیان کردوە ،پێیان وابوە ململانێی ڕاستەقینە لەنێوان میلەتان نیە بەلکو لەنێوان چینەکانە ،لە مانیفیستەکە بەجۆریك باس لە نەبوونی نیشتمان دەکا بۆ کریکاران ،بۆیە خەباتی رزگاری نیشتمانی داگیرکاربە(سانەوی)هەژمارکراوەو لە بەرامبەردا خەباتی پرۆلیتاریا دژی سەرمایەداری بە (ئەوەلی)هەژمارکراوە ، بۆیە بنەمای (تضحية الجزء من أجل الكل)[1650] کە خەباتی رزگاری بە (جزء) و ڕووخانی سەرمایەداریش بە(کل) پۆلین کراوە ، هەلویستی نیشتمانی حزبە شیوعیەکان زۆر جار وەك هەڵوێستەکانی ئەزموونی حزبی شیوعی تونسی بوو کە لە سالی 1919وەك درێژکراوەی حزبی شیوعی فرنسی دروست کرا، فرنسا وئیتالیاش داگیرکەری ئەو ناوچانە

---

[1648] انجلس- نصوص مختارە – تعلیق جانابا ص 322 .

[1649] مختارات-لینین.

[1650] (تضحية الجزء من أجل الكل) لينين دايهينا له(المؤلفات الكاملة: "خلاصة المناقشة حول حق الأمم في تقرير مصيرها بنفسها"، ج19 ص261 – 262). کە کورد تیایدا (جزء) و ڕووخانی سەرمایەداریش (کل) بوو،یان لە باشترین دوخیدا کوردستان (جزو) و عێراق (کل) بوو!،

بوون بۆیه حزبی شیوعی تونسی نەیتوانی ئەو دوو دۆخه به سەلامەتی کۆ بکاتەوە، له ئەنجاما کەوته بەرەی فرنسی لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی تونسی، هەرچەنده لەسالی 1934له حزبی شیوعی فرنسی جیا بۆوە بەلاّم ئەوپەلّەیه له کۆلّ مێژووی ئەو حزبه نەبۆوە تا گەشه بکا، ئەو نمونانه به ڕوونی ئەوە پیشان دەدەن که زەق ترین پارادۆکس لەو ڕووەوە سەری هەلداوە، هەردیسان لەنێوان شیوعی ئیسرائیل جێی سەرنجه چونکه یەهود زۆر دەمارگیرن،کەچی خودی حزبی شیوعی ئیسرائیل(راکاح)[1652]زیاتر هەلویستی ولاتانی سۆشیالیستی دەگرتەبەر نەك حکومەتی ئیسرائیل وبنەمای زایۆن، له پەیڕەوی ئەو حزبه زایۆنی به ڕەگەزپەرست وەسف دەکرد، زیاتر لەوەش له کۆنگرەی (16)ی جەنگی حوزەیرانی به دریژکراوەی ئیستعمار وەسف کرد[1652]،سەربازگەی سۆشیالیستی وایان کرد له 15/ئۆکتۆبەری 1975 بڕیاڕی (الصهیۆنیه شکل من اشکال العنصریه)دەرچوو له نەتەوە یەکگرتوەکان ، دوای لاوازبوونیان ئەو بڕیاڕە لەخولی (30) ی کۆمەلەی گشتی 1996 هەلوەشیندرایەوە ، زیاتر لەوانه ،لەو بارەیەوە با گویٚ له ڕای فهد(سکرتیری حزبی شیوعی عیراقی) ڕاگرین له بارەی هەر ڕەخنەیەك له سەرکردایەتی ستالین و دەلّیٚ: (ئەوەی ستالین دەیلیٚ ودەیکا هەر ئەرکی شیوعیەکانی سۆفیەتی نیه وەك ئەرکێکی موقەدەس ودەق جیٚبەجێی بکەن بەلّکو ئەرکی هەموو پڕۆلیتاریای جیهانه پەیڕەوی بکا)[1653]، کەچی بۆ خودی سۆڤیەت وانەبوو وەك ئەو کێشەیه له نێوان ستالین وترۆتسکی بەزەق تر هەلگیرسا وپرۆلیتاریای نیشتمانی زال کرا لەو ئەزموونه به سەر پرۆلیتاریای جیهانی، جارجاریش باسی مافی چارەنوس کراوە ( قرار المؤتمر الأممي المنعقد في لندن عام 1896)[1654]– یان (مافی چارەنوسی لینینی)، کەچی

---

[1651] علی عزەت بیگۆفیچ لەکتیبەکەی (الاسلام بین الشرق والغرب) دەلیت سۆشیالیستی ویەهودیلەیەك سەرچاوە هاتوون، موسا هایس کاریگەریەی یەهودی بۆ مارکسیەت گواستۆتەوە (مارکس خۆشی یەهودی بە) .

[1652] بۆ ئەو مەبەسته بڕوانه : اللقاء لماذا هوغیرممکن مع یسارفی اسرائیل-محمداسماعیل نصیف ص67-68 هەروەها بڕوانه دەقی (مقررات المؤتمر السادس عشر للحزب الشیوعی الاسرائیلی-راکاح- هەروەها ئەودەقانه له مجلەی (الهدف) ژ:2 بلاوبوویتەوە ,گۆڤاری هدف بەرەی فلستینی بەسەرۆکایەتی جۆرج حەبەش دەردەچوو .

[1653]مؤلفات الرفیق فهد —حزب الشیوعی ولا إشتراکیة الدیموقراطیة ص23

[1654] "یعلن المؤتمر تأییده لحق جمیع الأمم التام في حریة تقریر مصیرها ویعرب عن عطفه علی عمال کل قطر یقاسي آنیا نیر الاستبداد العسکري أو القومي أو غیرهما، ویدعو المؤتمر عمال جمیع هذه الأقطار إلی الانضمام إلی صفوف العمال الواعین أي

بەشیکی تر دەڵین ئەوە لە ئەنجامی ئەو بنەمایە نەبوە ،بەلکو لە چوارچیوەی ریکەوتنی ئەلمانی وروسی بوە لە7/نۆفمبەری 1918بە ناوی (برنستلیتۆفسك) تیایدا دان نرا بە ئۆكراینا وفنلندا [1655]،ئەوەی ئەو بۆچوونە بەهێزدەكات یەكیتی سۆڤیەت لەسەردەمی ستالین جارێكی تر داوای فنلەندای دەكردەوە لە چوارچێوەی ڕیكەوتنیك لە 24 ئۆگستی 1939 لەگەل ئەلمانیای سەردەمی نازی ،كە بە (حلف مولوتوف- ریبنتروپ Molotov–Ribbentrop Pact) ناوزەد دەكرێت یان هاوپەیمانی (ستالین-هیتلەر) ، كە تیایدا بەلێن بەیەكتر درا دەست درێژی نەكەنە سەر یەكتر ، هەروەها دابەشینەوەیەكی تری پۆلەنداو فینلەنداو هەندێ بەشی تری ئەورووپای سەروو لە نێوان هەردوو لا، دوای ئەو ڕێكەوتنە لە 22 یونیو 1941 تێكچوو و سۆڤیەتیش كەوتە جەنگی جیهانی لەگەل ئەلمانیا .

*** *** *** ***

لە ڕاستیدا ماركسیەت بە بوێرانە بۆهەمو دیاردەو كیشەو پرسێك قسەی خۆی هەبوە ،ئێمە هەرە گرنگەكانمان هەلبژارد لەو دەرفەتە تەسكە .

## هۆیەكانی شكستی ماركسیەت :

هۆیەكانی شكستی ماركسیەت بۆ دوو تەوەری سەرەكی دەگەڕێتەوە ،یەكەمیان داڕووخانی سۆڤیەتەو تەوەری دوەمیش هۆكارە فكری وزانستی وسیاسیەكانی ماركسیە كە خۆی لە قەیرانەكانی

---

الواعين لمصالح طبقتهم في العالم أجمع، للنضال معهم في سبيل التغلب على الرأسمالية العالمية وتحقيق أهداف الاشتراكية الديموقراطية الأممية". وتبنى (لينين) هذا القرار : "بما أن هذا الحق قد أخذ به بصورة ميكانيكية نقلا عن قرار مؤتمرالحزب الاول (1898)، الذي أخذه بدوره عن مقررات المؤتمرات الاشتراكية الأممية، وهو .. تقرير المصير السياسي، أي تقرير مصير الأمم باتجاه الاستقلالالسياسي. وعليه فان صيغة تقرير المصير القومي، التي تعني حق الانفراد بالكيانالجغرافي،..

إن حق تقرير المصير، من وجهة نظر الماركسية عموما، لا يثير أية صعوبة. فليس ما يدعو جديا إلى الاعتراض على قرار لندن الصادر في عام 1896 ولا إلىفهم حرية تقرير المصير بمعني آخر غير معني حق الانفصال.

[1655] درێژەی ئەو ریكەوتنە لە:( الموسوعة الميسرة للمصطلحات ..ص75)بخوینەوە.

مارکسیەت دەنوێنێ ،لەهەردووکیشیاندا پانتایی هاوبەش هەیە،لە یەکەما دەست پیدەکەین بریتیە لە **تەوەری یەکەم: هۆیەکانی کەوتنی یەکێتی سۆڤیەت :**

خورد کردنەوەی هۆیەکانی کەوتنی سۆڤیەت گەلێ درێژخایەنە هەر دەتوانین بەشە سەرەکی یەکانیان لێ هەڵبژێرین، بەشێکی لە ژێرەوە کاری کردووە وەك لە سەروو باس کرا هەندێ قەیرانی بەردەوامیش هەر هەبوو لە ئابووریو سیاسیو کۆمەلایەتی و نەژادی ... هەندێکیشیان ڕاستەوخۆبوون بەو شێوەیە :

1- **فاکتەری زانستی** : ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی بنچینەکەی ئایدۆلۆژی بوو .. هەتا ئایدۆلۆژیەکەی سەلامەت بوو زۆر گەشەی کرد لەناوەوە و دەرەوە، دوای ئەوە زانست ودۆزینەوە نوێکانی گەردوونی و کیمیاو فیزیایو بایۆلۆجی و بە ڕووکاری نامادیو ئاینی ( یان وەك خۆیان گۆتەنی بەرەو میسالی) بە پێچەوانەی بناغە فەلسەفی یەکانی ئەو ئایدۆلۆژیایە هاتەوە [1] ژێر خانەکانی شکاندو بەرەو قەیرانی ترسناك رویشت .

2- **ئابووری** : ئەو هەموو بودجەو پێویستیە مادی یەی بۆ بەرێوەبردنی ململانێ لەگەڵ ڕۆژئاوایەکی خاوەن تەکنۆلۆجیا و سەرمایەداو ئابووریەکی زەبەلاح، هەردەم بارێکی قورسی ئابووری کەوتبووە سەر شانی، تێچووەکانی گەلێ زیاتر بوو لە لە داهاتەکانی، سەرەڕای جۆری بەرنامەی ئابووریو فەلسەفەی مولکی یەت و خراپی تەرزەکانی بەهۆی شیوعی یەت لەبەرهەمدا.

3- **سیاسی**: چەند ڕووداوێك لە جیهان هاتە پێش لەوانە :

أ- **بزووتنەوەی سەندیکا کرێکارەکانی** وڵاتانی سۆسیالیستی ئەوروپای ڕۆژهەڵات لەدوای ساڵانی 1980 سەریان هەڵدا بەتایبەتی لە پۆلەندا بەسەرۆکایەتی( لێخ ڤاونسا) ، ئەوانە نەك تەنیا داوای چاکسازیان کردبێ لەو وڵاتانەی خۆیان بەڵکو داوای نەمانی شیوعی یەتیان دەکرد، ئەو خاڵە زۆر کاریگەر بوو چونکە بەحیسابی فەلسەفەی مارکسیزم چینی کریکار ( پرۆلیتاریا) شیوعیەت دێنێتە دی کەچی ئەو بزووتنەوەی کرێکاران دروست بوو یەکەم داوای سڕینەوەی شیوعیەت بوو نەك سەرمایەداری کە پێچەوانەی هەموو بنەماکانی شیوعیەت و فکری مارکسی بوو .. ماکینەی فکری

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە بەشی زانستی لە خواروو .

شیوعیەت کەوتە سەرسورِمانێکی ئالۆز تا ئەو سەندیکایە لە پۆڵندە لە 1990/12/9 بۆ یەکەم جار لەرِێی هەڵبژاردن سەرکەوتن و حزبی شیوعی لەبەرامبەریان شکستی هێنا .

ب- **شۆرشی ئیسلامی لە ئێران** : شۆرشێکی سەرتاپایی بوو بە هەموو مانا پێچەوانەکانی ( یاسای شۆرِش لە شیوعیەتدا)، مەزنترین شۆرِش لەدژی بەهێزترین قەڵای سەرمایەداری لەسەر دەستی مەدرەسەیەك (ئاینی) کە(مارکس) بە (أفیون الشعوب )ی وەسف کردبوو، گوایە سستترین فاکتەر ئاینەو لێرەدا بەکارترین فاکتەر دەرچوو، بووە داینەمۆیەکی بەهێزی گۆرِانی جیهانیش زۆر بەکارتر لە شیوعیەت، جێگەشی بە شیوعیەت لەق کرد .

جـ- **شۆرِشی ئیسلامی لە ئەفغانستان** لەدژی داگیرکەری سۆڤیەتی، بۆ یەکەم جار سوپای بەهێزی سۆڤیەتی دووچاری شکستێکی وا بێتەوە، دیمەنێکی ناشیرینی بۆ جیهان و بۆ ناوەخۆش دروست کرد .

د- **رووخانی دیواری (بەرلین)** یش کە لە 1961/8/16 دروست کرابوو لەساڵی 1989 میللەت رِووخاندیان، ئەو دیوارە وا دروست کرابوو کە خەڵکی لە ئەڵمانیای (ئەزموون سۆشیالیستیو شیوعی) رِای دەکرد و ئەو دیوارە رێگری بوو، ئیتر بە رِووخانی ئەو دیوارە دیمەنی شیوعیەت و بلوکی سۆڤیەتی شەرمەزارو ناشیرن کرد ...

4- **فاکتەرێکی زۆر دەگمەن و یەکلاکەرەوە:** لەماوەی سێ ساڵ لە 1982هەتا 1985سێ سەرۆك مردن(چونکە لە سیستەمو حوکمی سۆڤیەت سەرۆك نەدەگۆرِامەگەر بمردبایە)،هەریەکە لە (بریجنێف، ئەندرۆبۆڤ، تشارنیکۆ) بەوماوە کورتە مردن، ئیتر رِێ خۆش بوو کە (گۆرباتچۆڤ) بگاتە ترۆکی دەسەڵات بەخۆیو ئەو بیرو بۆچوونەی (بیرۆسترۆیکاو گلازنۆست - واتە الانفتاح والاصلاح وأعادة البناء)، ویستی سەر قەپاغی ئەو مەنجەڵەهەڵچووە هەڵگرێ پێش ئەوەی بتەقێتەوە، ئەوە پاساوی ئەو چاکسازیانەی گۆرباتچۆڤ بوو کەلە ژێرخانی یەکێتی سۆڤیەتیو پەیوەندیەکانی ئەنجام دەدا، رِەوتی ئەو چاکسازیە بەرەبەرە کۆنترۆل و ناوەندیەتی دەسەڵاتی لەدەست دەدا و میللەتان و کۆمارەکانی سۆڤیەتیش بەرەبەرە سەریان راست کردەوە، گەورەترین کاریگەریش یاخوددوا چەکوچی مەرگ ئینقیلابەکەی حزبی شیوعی بوو لە 1991/8/19 دژی کۆرباتچۆڤ کردیان و سەرکەوتوو

بوون، گۆرباتچۆڤیان خانەنشین کرد بەناوی (بێتەندرستی ) دوور خرایەوە بۆ دوورگەی (قەرم)، لێرەدا دەوری ( پۆریس یالتسین ) بۆ ڕۆژی دووەم دەرکەوت کە ئەو کاتی سەرۆکی کۆماری ڕوسیا بوو (لە چوارچێوەی یەکێتی سۆڤیەت )، لە دژی ئینقیلاب ڕاپەڕیو خۆپیشاندان و مانگرتن لەناو ( مۆسکۆ ) دەوروبەریو نارەزایی کۆمارەکانی تر دوای (3) ڕۆژ ئینقلابچی یە شیوعی یەکان پاشەکشەیان کرد، گۆرباتچۆڤیان هێناوە دەسەلآت، بەلآم وەك دوا خەلیفەی عوسمانلی ئاسا بەبێ دەسەلآتیو بە پیاوە نەخۆشەکە مایەوە، زیاتر کۆنترۆل و ناوەندیاتی لەدەست چوو، کۆمارەکانیش داوای سەربەخۆییان بە ئاشکراتر کرد و حزبە شیوعی یەکانی کۆمارەکانیان دوورخستەوە، دوا دەستی پۆلآین لە یەکێتی سۆڤیەت و گۆرباتچۆڤ وەشێنرا ئەو کۆبوونەوەی نێوان ( بۆریس یا لتسین –سەرۆکی ڕوسیا، لیۆنید کراتشۆك-سەرۆکی ئۆکرانی، شوسکنیچ –ڕوسیای سپی ) لە 1991/12/8بەستراو کۆتاییان بە یەکێتی سۆڤیەتی هێناو هەلّیان وەشاندەوە بە رەسمی لە 1991/12/31 لە تەمەنی (69) سالّ و یەك ڕۆژ .

**تەوەری دوەم لەهۆکارەکانی شکستی مارکسیزم** : کەوتن وهەلوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت کاری کوشندەی کردە سەرجەم فکری شیوعی و مارکسی ،لەچالآکی کەوت، هەرچەند پاشماوەی شیوعیەکان تەنزیرێك دەکەن دەلّێن ئەوە پڕۆڤەیەك بوو مادام سەرمایەداری مابێت ئەوا شیوعیەت هەر بەدوای دێت، بەلآم ئەو تەنزیرەی ( پڕۆڤە )ش لاوازە چونکە کاتی خۆی ( لینین) ناوی لە شۆڕش و تەقەلآکانی 1905 و 1907 ی ڕووسی نابوو ( پڕۆڤە ) .

مارکسیەت هەر ڕیبازیکی فلسفی ووشك نەبوو بەلکو شەبەنگیکی بیروڕای فراوان لە بارەی ژیان ومرۆڤ وکۆمەلگەو سروشت وگەردوون بوو ، واتە تەواوی بابەتەکانی زانست وفلسفەو فکرو سیاسەت وئابووری وبە تیۆرو واقیعەوە دەگرتەوە ،دەتوانین بلیین ئەوەندە قوول ببۆوە وەك ئاین سەرتاپا خۆی دەناساند ،بۆیە باری قوڕس ببوو تووشی قەیران وشکست ببو بەو شیوەی خوارەوە :

**1–شکست لە تیڕوانین بۆ زانست وفلسفیەوە :** مەدرەسەی مارکسیزم کە نوێنەرایەتی بەرەی مادی دەکات باوەریان وایە (مادە فراوانترین مەفهومە)[1657] هەروەك دەلّێن هەرهەبوەو هەر

[1657] عرض موجز للمادیةدیالکتیکیة ص32

دەشمێنیٚ،وەسفی مادە بە (نەمر)دەکەن[1658]. ڕاوبۆچوونەکانی ڕوو بە ڕووی زانستی نویٚ بۆوە، دەرکەوت (اللامادی) یش شان بەشانی مادە دەور دەگێریٚ لەو بوونەوەرە، بەتایبەتی فیزیای کوانتەمی ئیستا، لینین خۆشی گومانی هەبوو لەوەی عەقلی ئادەمیزاد پرۆسەیەکی مادی ڕووت بێت، وتی ئەوەی بلێت تەنها مادەیە دیارە هۆشی نیە[1659]، لەو ڕووەوە لەهەرسیٚ بوارەوە شکستی زانستی هێنا پیش ئەوەی لە بواری فلسفیش شکست بهێنیٚ ،تێڕوانینی مارکسی لەسەر (لا نهائية العالم ووحدته) بیٚ سنوری گەردوون —وەك رای مادی و دە هریەکانی کۆن بینا کردبوو کە لەسەردەمی بۆبتلیمۆس لە کتیبی (مەجەستی )گوزارشکراوە [1660]، زانستی نویٚ یەکلای کردۆتەوە کە گەردوون سنووری هەیەو( لانهائی) نیە.

لە بارەی (مادیە الوجود) واتە هەموو شتێك مادی بێت.. ئێستا زانستی نوێی فیزیا،کیمیا، بیرکاری، پاراسایکۆلۆژیا.. نەك هەر (نامادیەتی)سەلماند بەڵکو هەر دەیخوێنن و (تطبيقات)ی لەسەر دەکەن. ئینجا نەیتوانی پێناسی فەلسەفی (ڕوح)، (عقل) و (توانا) و (راستی) و...هتد. بکات.

لەبارەی ماکینەی جوولەو گەشەی بوونەوەر پێی وابوو( هەموو شتێك ناکۆکەو بەو هۆیە گەشە دەکا).. ئەوە کرۆکی فەلسەفەی مارکسی بوو وەك لینین وای وەسف کردوە،کەچی تا ئێستاش لە سروشت ناکۆکیەك نەدۆزراوەتەوە بەو مواسەفاتە دیالێکتیکیەی مارکسی کە:

أ- سیفاتی جێگۆڕکیٚ هەبی. ب- هەریەکە مەرجی مانی ئەوی تریان بێت.

لە بارەی ئەو مواسفاتانە بەووتەکانی ماوتسی تۆنگیشەوە دەرناچیٚ،یەکەم مەرجی پەیوەندی دیالکتیکی بۆ هەر ناکۆکیەك ئەوەیە کە هەر لایەکیان مەرج بیت بۆ بوونی دوەم ، ئەوەتا مردن بیٚ ژیان هەبوەودەبیٚ بەلام ژیان بیٚ مردن نیەونابیٚ(یان وەك کتیبە گەورەکەی-اسس

---

[1658] ف انجلس- ديالكتيك الطبيعة ص87

[1659]عرض موجز للمادية اليالكتيكية ص63

[1660]**ئەرستۆ دەلیٚ لەو بارەیەوە یەك ڕەئی بووین تەنها لە نیوماندا ئەفلاتون رای وابوو گەردون تەمەنی هەیەو دروست کراوەو دروست کەری هەیە** – تهافت الفلاسفه ص15 دەلیٚ ئەرستۆ لە کتیبی (الطبيعة) ئەو باسەی کردوە.

الماركسيەاللينينيە-لەبارەی ديالكتيكی نيوان كۆمەلگەوسروشت) سروشت بێ كۆمەلگە بوەو دەبێ بەلام كۆمەلگە بێ سروشت نابێ ، ..لەگەل زۆر پرسياری تری بێ وەلام، لەسەر ئەو بنچينەيە 3 ياسای ديالكتيك دارژراوە ،دوای تویژينەوەی دەركەوت هيچی ياسا نين، هەتا خۆشيان ئەوەتا ستالين لە كتيبی (الماديە التأريخيە والماديە الدياليكتيكيە) (نفی النفی) پەراندوە لە ياسايی.

ئينجا ماركسيەت ويستويەتی لەرێی سروشتەوە ئادەميزاد بناسێ، فەلسەفەو ياساكانی سروشتی خۆی بە سەر ئادەميزاد پەيرەو بكاو چەوت دەرچوو، ئادەميزادی نەناسی لەبەر هۆيەكی سادە: ئادەميزاد تەنيا دريژكراوەی سروشت نيە وەك وای بۆ چووە.

2- **لەرووی ئابووريەوە:** ئابووری زۆر گرنگە بەلام تاكەفاكتەری يەكلاكەرەوە نيە ،نە تاكە ژير خانە و نە بەتەنيا بەرپرسيارە لە رووداوو پالنەرەكانی مرۆڤ ، نەميژووشی دروستكردوە وەك لە شيوعيەت هەيە، دەردی بنچينەی كۆمەلگەش مولكيەی تايبەتی نيە بەلكو زيادەكەی دەردە، نەك خۆی وەك لە شيوعيەت باوە وبرياری قەلاچۆی مولكيەت داوە .هەرگيز كۆمەلگەی بێ مولكيەت نە هەبوە نە دەبێ .

پيناسی (قيمة) و (فائض القيمة- زيدەبايی) لەگەل گرنگی زانستەكەشی نوقستانە و تاكە هۆی دەولەمەندی سەرمايەداری و هەژاری هەژاران نيە وەك لە شيوعيەت هاتووە،لە دوا قەيرانی سەرمايەداريش دەركەوت زيدە بايی جەوهەری سەرمايەداری نيە، ئەو قەيرانەش بەو فۆرمەی (ماركس- ئەنجلس- لينين) وينەيان كيشابوو وانەهاتە دی ،بەلكو لە ريی ئالوگۆری عەقارو هەلاوسانی پەراوە داليەكان هاتە دی كە پيی دەووتری(هرم المقلوب) ،ئينجا لە سيستەمی سەرمايەداری قەيرانی تريش هەيە لەوانە: قۆرخكاری ، سوو، حرام و حەلال، ريكنەخستنەكانی كەرتە ئابووريەكان، مولكيەتی تايبەتی بێسنور، سەرخانەكانی دەولەت، سياسەت، راگەياندن، ..لەدوای هەموو ئەوانە رۆلی ئينتمای چينايەتی وزيرەكی دەولەمەندەكەش هەمووی رۆلی خۆی هەيە.

له بارەی سیستەمی (دابەش)یش مادام له کۆتاییدا پرۆسەی بەرهەم و دابەش(توزیع) لێك بپچڕێ واته بەرژەوەندی تایبەت وبەرژەوەندی گشتی لیك بپچڕێ وەك له بنەمای شیوعیەت هاتووه(بە پێی توانا ئیش کردن و به پێی پێویست وەرگرتن )، ئەوا هەرگیز ئادەمیزاده بەرهەم هێنەرەکان دڵسۆز نابن بۆ کارەکەیان، مەگەر ئەخلاقی ئەو کۆمەلگەیه ستاندەر بیت، که له شیوعیەتیش ئەخلاق مادیه و تۆخمی ئاینی تیا نیه، نابێته یارمەتیدەرێکی ئەو بەرهەمه که هیچ بەرژەوەندیەکی خۆی تیا نیه، بۆیه جۆری بەرهەم و پێشەسازیەکەیان گەلێ خراپ بوو منافەسەی بازاڕی پێ نەدەکرا. هەروەك بینیشمان له ئەزموونی تەکنەلۆجیای وڵاتانی سۆشیالیستی چەنده کەل و پەلەکانیان خراپ بوو لەچاو سەرمایەداری.

3- **له ڕووی فلسفەی مێژوویەوە**—میژووی مرۆڤایەتی بریتی نیه له میژووی گەده یان گەڕان بەدوای خۆراك ،ئەدی هەموو ئاژەلێك گەدەی نیه بۆگەشه ناکەن ،فاکتەری ئابووری یەکلاکەرەوەی ڕووداوه میژووی و واقعیەکان نین ،بە تەنهاش له ململانێی چینەکان (صراع الطبقات) نەهاتووه وەك لای شیوعیەت باوه. - گوایه کۆمەڵگه (6) قۆناغی بڕیوه (مەشاعی- کۆیلایەتی- دەرەبەگی- سەرمایەداری سۆشیالیستی- شیوعیەت) ئەوه مێژووی توێژێکی کۆمەڵە نەك هەمووی، هەرگیز (مشاعی) سەرەتای کۆمەڵ نیه، ئەو بۆچوونه له (تیۆری پەرەسەندن) هەڵدەقوڵێ‌ئەویش له فەلسەفەی گەردوونی وەستاوی هەتاهەتایەی (دەهری) که به زانستیانەهەردووکیان چەوت دەرچوو.

4- **لەبارەی ئاینەوە:** - ئەو تێڕوانینه (الدین أفیون الشعوب) تەنها بۆ سەردەمی مەسیحیەتی (دەسەڵاتی کڵێسا) نەك بۆ هەموو ئاین، ئەوەتا ئیسلام (نەك ئەفیون) بەڵکو هیچ هاندەرێکی ئادەمیزاد به ئەندازەی ئیسلام نیه چالاکی بکات، بۆیه وابه بیچەوانه وبەتوند ڕەو وەسف دەکری*.

ئایینیش له فرەخواییەوە(Poly theism واته فره خوایی) بۆ یەك خوایی نەهاتووه، له ترس ونەزانین ( agnostism)و بێ‌تەفسیری دیارده سروشتیەکان نەهاتووه.. ئەو تێڕوانینه ئەوەنده چەوته بووەته شەرمەزاری زانست لەو سەردەمەی تەکنەلۆجیا و زانست که به سەردەمی رابوونی ئاینەکان

*له ڕاستیدا ئەگەر ئیسلامێکی ناسیاسی و سست بێ ئەوا پێی دەڵێن (افیون الشعوب )ە،ئەگەر سیاسی وبزێویش بێ به توند ڕەوی وەسف دەکەن .

دەناسرێ ، ئەو دژایەتیەی ئاین وای کرد مارکسی نەبتە بزوتنەوەیەکی میلی بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامی ،لەزۆر شوین فتوای فەرمی دژیان دەرچوە ،لەوانە فتوای محسن الحكيم –دەقەکەی: (بسم الله الرحمن الرحيم لايجوز الانتماء الى الحزب الشيوعي فأن ذلك كفر والحاد او ترويج للكفر والالحاد اعاذكم الله وجميع المسلمين عن ذلك وزادكم ايمانا وتسليما . والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته 17شعبان1379 – **محسن الحكيم**[1661].

**5- لە رووی فکر و ئایدۆلۆژیا: -** فکر جولەو گەشەی سەربەخۆی هەیە تەنها رەنگدانەوەی واقع نیە. وەك مارکسیەکان وای بۆ چووبون، ئەگەر وابوایە چۆن بەپێش واقع دەکەوت و داهێنانی دەکرد ، فەلسەفە و بیرکاری و درۆ و زۆر شتی تر واقعەکەی نیە، کەچی لەفکر هەیە. ئەو مەبدەئەی مارکس (بوونی کۆمەڵایەتییەکەت هۆشمەندیەکەت دیاری دەکات، نەك پێچەوانە)، نەخێر بەهەردوو سەری راستە و هێشتا فاکتەری تریش هەیە لەو پرۆسە ئالۆزە بەشدارە. بۆیەش پیناسی مرۆڤ بە( ئاژەلی بەرهەمهینەر) لاوازە ، هەر لەوەشەوە کەوتونە هەلەیەکی تر و پێیان وایە مرۆڤ و تەبیعەتەکانی گوایە لە سەرو کەللەی نیە بەڵکو لە بازارەکەیەتی، نەخێر زیاتر لە سەرو کەللەیەتی لەگەڵ کۆمەڵێك هۆکاری ئالۆزی ترە بە بازاریشەوە. راستە لە سەرەتادا فکر دیلی واقع و دەوروبەریەتی، بەلآم دوایی دەبێتە پێشرەو و بزوێنەری هەمان واقیع.ئینجا نەیتوانیوە بە روانگە فەلسەفیەکەی جیاوازی نێوان عەقڵی ئادەمیزاد و عەقڵی ئاژەڵەکان بقەبلێنێ و هەندێ جار یەکسانی کردووە. کە سەرچاوەیەکی بنەرەتیە لە زۆربەی چەوتیەکانی مارکسیزم.

**6- تێروانینیان بۆ ئادەمیزاد -** ئادەمیزاد لە زنجیرەی پەرەسەندنی مەیمون.. نەهاتووە، ئەوە چەوت دەرچوو، بەپێی زانستی (ئەندازەی جینەکان) ئادەمیزاد لەکۆنەوە تا ئێستا هەر ئەو ئادەمیزادە بووە. گوایە" کار" ئادەمیزادی دروست کردووە. وەك لامارك مەزندەی کردو داروین ودوای تەواوی

---

[1661] لاهوت السياسة ص47

مارکسیەت زانستیشی پێ هەڵخەڵەتا[1662]. ئەدی هەر ئادەمیزادیش کاری دروست نەکردووە، ئەگینا بۆ ئەو کارە ئاژەڵێکی تری نەگۆڕی.

ئادەمیزاد دەوری سانەوی نیە لە دروستکردنی مێژوو و رووداوەکانی ئێستاش، هەر بە نموونە: لە وەڵامی گەشەکردنی ئادەمیزاد و کۆمەڵ دەڵێت: ناکۆکی نێوان پەیوەندی بەرهەم هێنان و هێزی بەرهەم هێنەرە، پەیوەندیەکە چەسپاوەو هێزەکە لە جووڵەیە، جا پرسیارەکە دووبارە دەبێتەوە، ئەی هێزەکە بەرهەمهێنەرە چۆن گەشە دەکات؟ دەڵێن بەهۆی ناکۆکی نێوان ئادەمیزادەکەو ئامرازەکانی بەرهەمهێنەر[1663]. ئالێرەدا دزەکە گیرا بە پرسیارێکی زیاتر، ئایا ئادەمیزاد خاوەنی ئامرازەکەیە یا بە پێچەوانە؟ کامیان کامیانی دروست کردووە؟ هەڵبەتە ئادەمیزاد.. کەواتە هاتینەوە سەر پرسیاری یەکەم بێ وەڵام لەدوای ماندووبوونێکی زۆر، بەو شێوەیە فەلسەفەی مارکسیزم وەڵامی پرسیارە نەمرەکانی پێ نادرێتەوە.

7- **لە رووی کۆمەڵایەتی و خێزانەوە** - کۆمەڵ دابەش بووە بۆ کۆمەڵێك توێژ و چین و دەستەو تاقم.. بەڵام لەسەر بنچینەی پەیوەندی بەرهەم هێنان نیە بە تەنها، ئینجامەرج نیە ووشیاری فکریەکە و بیروبۆچوون و ئینتیما سیاسی جووت بێت لەگەڵ باری کۆمەڵایەتیەکەی و ئەویش لەگەڵ باری ئابووریەکەی، ئەوەتا پڕی نموونەیە چەندین ئاغە شیوعی بووینە، چەندین کرێکاریش دەوڵەتی بووینە.. هەر مارکسیەت لە دامەزراندنیەوە تا بڵاوکردنەوەو پەیڕەوکردنی هیچی سەرکردەی کرێکاری نەبووە بە مانا و پێناسی پرۆلیتاریا.مەرجیش نیە پەیوەندی نێوان پرۆلیتاریا و برجوازیش هەر دوژمنداری بێت. چینی ناوەندیش نەبووە پرۆلیتاریا وەك (مارکس) لە کتێبی (بۆس متزاید) پێشبینی کردبوو.

---

[1662] ئەنجلس کتێبێکی بەناوی ( دور العمل في تحول القرد الى الانسان)،ئەو عنوانە لە بنەچەدا لە ( **فریدریك انجلس–دیالكتیك الطبیعة –دور العمل فی تحول القردال انسان ص194–208**) هاتوە، دوای کرایتە کوراسەیەکی سەربەخۆ.

[1663] تا ئێرە وەڵامەکەیە کە لە کتێبی (اسس مارکسیە اللینینیە) هاتووە.

-لەبارەی گەشەی خێزانیش لە سەرەتای کۆمەڵی (دایك سالاری) نەبووە[1664]، خێزانیش هەر هەبوو لەگەڵ بوون و مانی ئادەمیزادە. پەیوەندی (هاوسەریش)یش ناکۆکی برجوازی و پرۆلیتاریا نیە وەك (انجلس) لە کتێبی (أصل العائلە..) و مارکسیش لە (العائلە المقدسە) وتوویەتی[1665]، بەڵکو پەیوەندیەکی تەواوکەری یەکتریە، کوا کام مەرجی پرۆلیتاریا و برجوازی لە پەیوەندی ژن و مێردا هەیە هەر بەپێێ مەرجەکانی خۆشیان؟

8- **لەڕووی سیاسیەوە:** - ئەگەر هاتنی شیوعیەت حەتمی بێ، ئی دی حزبایەتی و شۆڕش و ئەو هەموو خوێن ڕشتنەوەی بۆ چی بوو؟ ئەی گفت نەبوو لەکۆتایی ئەو سەدەیە بێت (وەك لینین لە مزگێنیەکەی دای)، بەپێی پێشبینیەکانی (مارکس- ئەنجلس- لینین) دەبوایە شۆڕشی پرۆلیتاریا لە وڵاتە پێشەسازیەکان بکرابایە (ئەڵمانیا- فەڕەنسا- ئینگلتەرا..) لە چوارچیوەی ناکۆکی پەیوەندیەکانی بەرهەم وهیزی بەرهەم ، کوا تاکە یەك نموونەی سیاسی نیە کە دەوڵەتێکی سۆشیالیستی بەپێی مەرجەکانی مارکسیزم (واتە لەرێی یاسای ناکۆکی) کەچی نمونەیەکی نەبێت. بەپێچەوانەوە بزوتنەوەی کرێکاری بوو(لە سەندیکاکان) بوونە قەڵغان لەدژی شیوعیەت و لەسەردەستی ئەوانە شیوعیەت داڕووخا، بە پیچەوانەوە لە وڵاتە دواکەوتووەکان مارکسیەت و شۆڕشی شیوعیەت ڕوویدا لەرێی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوایەتی هاتەدی کە لە فەرهەنگی مارکسیەت بە (ململانێی سانەوی) حساب بوو، هیچی لەڕێی ناکۆکی هێزی بەرهەم هێنەر و پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنەر نەبووە تا شۆڕشێکی سەرتاسەری جیهانی و شیوعیەتی پێ دابهێنن ، کوتایسەدەی بیستەمیش تەواو پێچەوانە هاتەدی شیوعیەت تێك ڕووخا نەك سەرمایەداری ، زیاتر لەوەش ئەوە تیۆری سەرمایەداریە لە هیرشدایەو دەلێ سیستەمی سەرمایەداری و لیبرال دیموکراسی کۆتایی میژوو ە .

---

[1664] یەکەم کەس ئەو ناوەی داهێنا (باخۆفن 1815-1887)ی سویسری بوو لەکتێبەکەی(حق الام) بە پێی (**مقدمة فی انثروبولوجیة الإجتماعیة** ص31 ) .

[1665] هەلویستەکانی مارکسی وشیوعیەت لە بارەی ئافرەت وهاوسەری و..لە کتێبێك بە ناوی: ئافرەت لە ڕوانگەی ئاینی وعەلمانی —دانەر بخوێنەوە .

ئەگەر دنیای شیوعیەت بەهەشت و سەرمایەداریش دۆزەخ ئەوا ئەو دیوارە شەرمەزارەیەی بەرلین بۆچ بوو؟ (ربیع پراگ) ئەو هەموو راپەڕینانە، سەندیکای کرێکاران، (خۆپێشاندانی مەیدانی تیانیامین لە چین... هەمووی بۆچی؟)

ئەگەر راستە شۆڕش لەسەر بنچینەی (بازدانی –پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان) دێتئەوا دەبوایە لەگەڵ یەکەم گڵپەی شۆڕش سەرتاسەری جیهانی بگرتابایەو لە قۆناغی سەرمایەداری بگوازرابوایە بۆ سۆشیالیستی وەك ترۆتسکی لە کتێبی (الثورة الدائمة) بۆی چووە و ڕاست بوو، کەچی لە دواییەکەی لەسەر ئەو بۆچوونەی تیرۆر کرا ترۆتسکیەت بووە تۆمەت.

**9- لەڕووی پیادە واقعیەوە:** لە دوا هەنگاو رەوتی گەشەی کۆمەلگە شیوعیەتی نەپالاوت و کۆمەڵگەیەکی نمونەیی شیوعی پێشکەتوویان پێ دروست نەبوو، چجای دادگەری، ڕژێمەکان بەناوی دکتاتۆری پرۆلیتاریا بوونە دیکتاتۆری تاك حزب و دوایش دیکتاتۆری تاکەکەسی، هەندێکیان بەرەو پادشایی شیوعیانە وەرچەرخان وەك لە کۆریای سەروو(کیم ئیل سۆنگ) مرد کوڕی هاتە جێی ودوای دووپشتی تر هەر وا میراتیە، ئێستاش لەکۆبا فیدل کاسترۆ براکەی خۆی کردۆتە سەرۆك..لەگەڵ زۆر نمونەی تر.

لەبەر ئەوەی مەرجەعی فکری چەسپاو نەبوو بە پێی دەقەکانی مارکسیەت ،ئەوا بۆ چارەی کیشە فکریەکانیش بە هێز یەکلایی دەکرایەوە ودەبوە، سزاو تیرۆر وداگیرکاری وەك تیرۆری ترۆتسکی ،نەفی کردنی ساخارۆف بۆ سیبیریا ،داگیرکردنی پۆلەنداوکەمبۆدیا دوایش ئەفغانستان و...زۆری تر ،بەو شێوەیە ئەگەر کێشەیەك پەیدا ببوایە (وەك عێراقچی و کوردستانچی –لای خومان) ئەوا هیچ یاسا و دەقێکی چەسپاو نەبوو بگەڕێنەوە سەری بۆ (تحکیم)، بۆیە دەبینین لەو تەمەنە کورتەی شیوعیەت زیاتر لە (50) مەزهەبی شیوعی سەری هەڵداو زیاتر لە (200) زاراوەی تۆمەت هەر لە (ئەنسکۆلوبیدیای سۆڤیەت) هاتووە وەك (تحریفی، ماووی، ترۆتسکی، ئیسلاحی، جمود فکری عەقائیدی، دیماگۆگی،...هتد)، هەندیك لە خودی مارکسیش توند ترن لەوانە تۆلستۆی ویاخی بوونی تاقانە (ولیام جۆدین) وماکس شتیرنی(خاوەنی نظریة تمرد الفردی).ززیاتر ئەو مزایدانە لەبارەی

ئازادی له دوای شۆرشی فرنسی هات ،له شیوعیەکان:پرۆدۆن(خاوەنی دروشمی:الملکیه هی سرقه)له بارەی دەولەتیش (حکم الانسان للانسان هو عبودیه) وکرۆپتکین وباکۆنین(تحطیم کل ماهو واقع خیر) و..تەنانەت باکۆنین منافسەی خودی مارکسیشی دەکردو زیاتر مزایدەی شیوعایەتی له خاوەنەکەی دەکرد ، دروشمی گشتی فەوزەوی: نا بۆ ئاین ودەولەت وتەخت وخودا )لایەنگری تیرۆریش بوون.. ریکخراوی تیرۆریستی وەك بادماینهۆڤ زئەلویه الحمراو ..

**10-دابەشی وترازانه گەورەکانیان** : لەخالی (9) دەرکەوت ئەو هەمو ریباز وناکۆکیەی لەو ماوەکەمه پەیدا بوو ،بەلام لیره باسی دابەشی و لیکترازانه بنچینەییەکان دەکەین که کاریگەری لەسەر مەیدانی دەولی دروست کردو بوه هۆی لاواز کردنی مارکسیەت ، لەهەموی کاریگەر تر خەتی ماوی بوو که چین سەرپەرشتی دەکرد ، ئینجا ترۆتسکیەت ،ئینجا ئۆرۆشیوعیەت ..هەندێ له تەیاری توندیش پەیدا بوو له نێوان دووبەش که بەشێکیان ئەوەنده له مارکسی دوور کەوتبوونەوه ناویان به (سۆشیال دیموکراسەکان)دێت و لەگەل بەشیکی تری سەر بەسۆڤیەت ،ئەوانه زۆر توند بوون وەك ریکخراوەکانی بادرماینهۆڤ وئەلویەی حەمراو باکۆنی و...، ئەوانه خەریکه بلیین بریتین له سەلەفی مارکسی ,جاریش وایه دەلێن  ئەو پەرتەوازەییه ناگەڕێتەوه بۆ خودی مارکسی بەلکو ژینگەو دەوروبەر وای لێدەکات ،باس له نمونەی سۆشیال دیموکراس دەکرێ ،سزاو ئیجرائەتی توندی دەسەلات بەرامبەریان توندڕەوی دروست دەکات نمونەی برنشتاین که سۆشیالیستیکی میانڕەو بوه له ئەلمانیا بەلام بسمارك لەله سالی 1878 ئەو حزبەی هەلوەشاندۆتەوه و برنشتاینی له وولات دوور خستۆتەوه بۆسویسرا، دوای لەویش له گەل کاوتسکی دوور خراینەوه بۆ بریتانیاو بوه هاوڕیی ئەنجلس ، لەوێ بەرەو مارکسی وتوندی رۆیشتوه ، دوای حزبەکەی له ئەلمانیا ڕێی پیدراوەو له هەلبژاردن سەرکەوتەوه لەمارکسیەت هەلگەڕایەوەو بۆوه سۆشیال دیموکراسی[1666] .

<u>بۆ دۆزی کورد به تایبەتی</u>

---

[1666] بۆ ئەو سەربردەیەی برنشتاین بروانه : معجم المؤلفات السیاسیة ص183

شوێنی خەباتی گەلان لە فکری شیوعیەت دا وەك لە (مانفیێستەکە) هاتووە (کرێکاران نیشتمانیان نیە)، بۆیە زۆربەی حزبە کۆمەنیستەکان هەڵوێستیان بەرامبەر کێشەی کورد سەلبی بووە، جار وابووە بە چەك دژی وەستاون، ئەو وەسفەی (کوردایەتی شەرمەزاریە) کە لەسەر دیوارەکانی کوردستان دەنوسرا لە دیدێکی رەسەنی مارکسیەوە هاتووە، هەڵوێستی حکومەتانیش خراتر بوون ، بە گشتی سیستەمی سیاسی و دەوڵەتە شیوعیەکان بەرامبەر کورد نێگەتیڤ بووە زیاتر پاڵپشتی داگیرکەرانی بووینە، ئەگەر چی لەسەرەتا هەندی جارپۆزەتیڤیش بووبیت.

- وەك ئەزموون دەرکەوت لەناو سۆڤیەتیش کێشەی نەتەوایەتی چارەسەر نەببوو ئەوەتا لەپاش مەرگی ئەو هەموو کێشە نەتەوەییەی بەجێ هێشتووە، هەریەکە لە (ئۆکرانیە، کازاخستان، ئۆزباکستان، ڕوسیایسپی، جۆرجیا، لتوانیە، ئازەربێجان، مالدڤیە، تاجکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستونیە، قیرغیزستان ) لێی جیابوونەوە ، کەچی جاران مارکسیەکانی کوردستان هەردەم نمونەیان بە سۆڤیەت دەهێناوە گوایە کێشەی نەتەوایەتی چارەسەرکردووە.
- هەر لەپێش و پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر1917ی رووسیا و شیوعیەت بەشێك بوون لە دروست کردنی مەینەتی کورد: هەتا رێکەوتنی (سایکس- پیکۆ – سازانوڤ 1916) بە رەسمی خەملی، لینین خۆشی دژی بزووتنەوەی کورد بووە لایەنگیری کەمالیزم بوو. ئەزموونەکانی کۆماری مهاباد 1946 ئەزموونی شۆڕشی ئەیلول 1960- 1975.. چاکترین بەڵگەی بەرجەستەن.
- کوردی سۆڤیەتیش لەسەر دەستی هەریەکە لە ستالین و خرۆشۆف و بریجنێف پەرت و بڵاوکران.
- لە ساڵی 1974 دووبارە بە ناپاڵم و فڕۆکەی سۆڤیەتی بۆ ژن و منداڵی کورد هاتنەوە مەیدان.
- حزبە کوردستانیەکانی تریش کە (مارکسی لینینی)یان وەرگرتبوو وەك (اهتداو) ئەوا کێشەی کوردسانی زۆر دواخست، بووە هۆی (ئینشقاقات) و (شەڕی کورد و کورد) (بێ ستراتیژیەتی) دەست نیشان نەکردن و تێکەڵاَ کردنی: (دۆست و دوژمن)و (اولویات و سانەویات- موازنە)، (ئامانج و ئامراز)، (ئاسۆیی و ستوونی)، (ڕزگاری نیشتمانی و رزگاری کۆمەلأیەتی)،...هتد.

(59)

# ئایدۆلۆژیا الأيديولوجية ideology

ئەوانەش دەگریتەوە(doctrine ،لۆگۆس، میتۆس، ئایدیۆلۆجیای جاکۆپیان،بیلیڤ، زکگورتی،..)

بە زۆربەی زمانە جیاجیاکانی ئەوروپا بە(ideology) هاتوە،لە دوو برگە پیکهاتوە ( Ideo ) بیرۆکە ،logولوجیا واتە زانست[1667]، ووشەیەکی تەواو هاوتای عربی بەرامبەری نیە بۆیە کۆمەڵێك ووشەی وەك(ذهنية، عقلية عقيدة، مذهب، رأي، فكر ومنظومة فكرية،حديث الفكر، عام الافكار، منظومة تصورات،رؤيةالعالم..) بۆ دانراوە ،لە زمانی کوردیش هاوتای وای نیە، چەمکێکە لە دوو وشەی لاتینی پیك هاتووە، ئایدیا مانای بیروباوەڕ، لۆگۆسی یۆنانی بەمانای زانست،یان عەقلانی، بەگشتی جاران دوو جۆر کۆمەلگە هەبوو ،کۆمەلگەی ئەفسانەی(میتۆس) کە پشتی بە ئەفسانەو کاری هەلخەلەتینەرانە دەبەست و لەدواکەوتوویی بوە ، کۆمەلگەی عەقلانی (لۆگۆس)یش ئەوانە بووینە پشتیان بە (هۆکار-اسباب) سود لە یاسای سروشت وەردەگرت،یان وەك( موسوعات الفلسفيه)پێی وایە لۆگۆس (بە لاتینیەکەی -λόγος ) بەمانای (زانست ، گوتار)لێکدایتەوە ، ئەوەی دوای کاری هەرەسەرەکی پیغمبەران بوە تا کۆمەلگە بتوانێ پەیام وەرگرێ و شارستانی بەرپا بکاوەك لە ئینجیلی یۆحناش واهاتوە (فی البدء کان الکلمة) واتە لۆگۆسی، لەسەر ئەو بنچینەیە ئایدیۆلۆجیا لەسەدەی 19 جارێکی تر دێتەوە مەیدان لەجیاتی بڕوای میتافیزیکی .

یەکەم فەیلەسوف (دیسترات 1755- 1863)ی فرنسی لە کتێبی (elemenis of edeology) ئایدیۆلۆژیای بەکار هێنا،بەشیکی تر پێیان وایە کەمیك پیشتریش و دەیگێڕنەوەڕاستەوخۆ بۆدوای شۆڕشی فرنسی 1789و ئەو کاریگەریانەی پەیدای کرد،ناوی ئایدیۆلۆجیای جاکۆپیان پەیدابوو، دوای ئەو هەمو سەرئیشەیەی دروست بوو لەو شۆڕشە ناپلیۆن ئایدیۆلۆجیای وەك پرۆگرامی خویندن

---

[1667] کارل مانهايم -الإيديولوجية والطوباوية - ت: عبد الجليل طاهر ص10-.

دوور خستەوە ،دوای جارێکی تر هیگل بە نارێکی بەکاری هێناوەتی[1668]،دوای دیستـرات (سـەتندال) بەکاری هێنا وەك لە(الموسوعە لالاند الفلسفیە )واهاتوە ، ئینجا مارکس کتیبیکی بە ناوی (ایدیۆلۆجیە الالمانیە)بلاو کردەوەو لە فلسفەی مارکسیەت بە شیوەیەکی فراوان ئەو چەمکە بەکارهات ،تا ئەو ساتەش ،بۆیە بەشێك پێیان وایە ئایدیۆلۆجیا هەبوە بەلام مارکس بەکاری هێناو باوی وەرگرت لەوانە (موسوعە علم الاجتماع - کە تەرجەمەی فەرهەنگی ئۆکسفۆردە) ،بەلام لەگەل ڕووخانی شیوعیەت ڕەخنە لە خودی ئایدیۆلۆجیاش گیراوە ،لە ڕیزی شمولیەت وداخراوی ودۆگمایی ودژبە ئازادی هەژمارکراوە .

هەرچی ئایدیۆلۆجیکارە ئەوە بەو زاناو بیرمەندانە دەوترێ کە خەریکی داهینانی فکری ودارشتنی نەخشەریگەی ئایدیۆلۆجیان،هەندیك ئایدیۆلۆجیاو عقیدە یەکسان دەکەن ،ڕاستە زۆر لایان لێك دەچی وهەردوولاشیان لە کۆمەلە فاکتەرە ئاسۆییەکانن، بەلام ئەوانەی ووردن تا ڕادەیەك لێکی جیا دەکەنەوە ،ئەوەی زادەی بەشەری بیت بە (ئایدیۆلۆجیا)ناوزەد بکریت ، ئەوەی ئاینیش بە(عقیدە)، جاران عقیدە بەکارنەدەهات بەلکو زاراوەی (ئیمان)بەکاردەهات –یەکەم جار زاراوەی عقیدە لەلایەن (القشیری-437هـ)لە کتیبی(الرسالە)داهێنرا،دوای ئەویش (ابوحامدالغزالی)بەکاری هێنا[1669] ،لە ئینگلیزیەکەی بەرامبەر ئایدیۆلۆجیا (بیلیڤی- bilive)ی بەکارهێناوە کەدەکاتە بیروبڕوای تاك ،یان جاری وا هەیە دەلێن ئایدیۆلۆجیا بۆ علمانیەو عقیدەش بۆ ئاینی ،زیاتر لەوانەش هەیە پێی وایە ئایدیۆلۆجیا ڕێك بریتیە لە ئاینی عەلمانی ،ڕاستیەکەی ئاواش نیە ئایدیۆلۆجیا زیاتر زادەو بەرهەمی عەقلە ، بۆیە دەتوانین بلیین ئایدیۆلۆژیای ئاینی مادام تیگەیشتنەکە زۆر عەقلانی بوو زیاتر ئەو ناوە هەلگرێ ئەگەریش دوگمایی و داخراوی بێت ئەوە جاروایە مەزهەبی وتایفی پێدەگۆترێت ،تیڕوانین بۆ

[1668]تعریفات ببعض المصطلحات –مکتب الثقافة والاعلام ص33 .

[1669] المعجم المناهی ص666.

ئایدیۆلۆجیا گەلێ زۆرە ، لە ئەنجامی بۆچوونی جیالەبارەی ئەسلی و شمولیەتی و سەنگاندنی پیناسی جۆربەجۆریشی لێدروست بوە ،هەندیکی هەلدەبژیرین :

+قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة: ئایدیۆلۆجی لە دوو وشەی یۆنانی پیکهاتوە ئایدیۆ واتە بیر  لۆگۆس مانای زانست (ئەقل) واتە (زانستی فکر ) ،ئیستاش مانای باوەڕ هێنان بە شەبەنگیکی فکری ڕەهەندە جیهانیەکان[1670].

+فەرهەنگی سیاسی(ئارش) : هەرشێوە بیرکردنەوەو تیۆریك گۆڕینی جیهانی بکات بە ئامانج [1671].

+الموسوعە المیسرە ..: ئایدیۆلۆجیا مانای کۆمەلە بیروباوەریکە دەبیتە بەلگەی نەخشەریگەی کار بۆکۆمەلە خەلکیك [1672].

+( موسوعات الفلسفیە المعاصرە): ئایدیۆلۆژی مانای زانستی هزر،یان بیروڕاهزریەکان [1673]

+موسوعەالمارکسیە: نسق من الآراءوالأفکار السیاسیة والقانونیة والاخلاقیة والجمالیة والدینیة .

+قاموسی سۆڤیەتی: شەبەنگیك لە بیرو بۆچونی  سیاسی و ئەخلاقی وئاینی وهونەری کە پیك دیت لە رەنگدانەوەی بەرژەوەندیە مادیەکانی چینیك [1674].

+مارکس(لە کتیبی :ایدیولوجیە الالمانیە 1829) :کۆمەلە بیروڕایەکە لەناوکۆمەلگەیەکی دیاری کراو خەملیە بەهۆی بارودۆخی سیاسی وئابووری زالی ئەو کات.

+کارل مانهایم: نزیکە لە پیناسی مارکسی و پییوایە بریتیە لە شەبەنگێك لە بیروڕای ڕێك کە گوزارش لە چینیکی کاریگەری کۆمەلگە دەکات .

---

[1670] قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیةص85

[1671] فەرهەنگی سیاسی-ئامادەکردنی (زاهیرمحمدی ، تەرجەمەی (قاموس سیاسی ئارشی فارسیە) ل46

[1672] الموسوعة المیسرة للمصطلحات السیاسیة  ص66

[1673] احمد عبدالحلیم عطیة – موسوعات الفلسفیة المعاصرة ص45 –

[1674] القاموس السیاسي – بونو ماریوف، ترجمة واعداد:  عبد الرزاق الصافي  ص77

+ كارل منهايم -(الايديولوجية والطوبائية- 1936 )ايديولوجية هى الأفكار المشوهة التي تطلقها الطبقة الحاكمة لتحافظ على النظام الاجتماعي .

+ماركسيه نوێیەکان : ڕەنگدانەوەیەکی بیرە بۆ ململانێی چینایەتی ڕاستەقینە.

ئەنجلس: شەبەنگێك لە بیروڕای هەماهەنگ دەکەونە چوارچێوەی یاسای خۆی[1675] .

+ قاموس علم الاجتماع : هى نسقا من المعتقدات والمفاهيم (واقعية وعيارية) يسعى إلى تفسير ظواهر اجتماعية معقدة من خلال منطق يوجه ويبسط الاختيارات السياسية والاجتماعية للأفراد والجماعات .

+الوسوعة الحديثة ..: ئةو بيرو رِايانةى حزب يان حكومةت كة تؤبزى جيبةجىَ دةكريَت يان بة خؤشي[1676].

+ دیتراس ئەو فەیلەسوفەی کە یەکەم جار ئایدیۆلۆجیای بەکارهێنا پیناسی بە سادەی کرد: زانستی هزرەکانە .

+ ايديولوجية هي ناتج عملية تكوين نسق فكري عام يفسر الطبيعة والمجتمع والفرد، ويحدد موقف فكري معين يربط الأفكار في مختلف الميادين الفكرية والسياسية والأخلاقية والفلسفية.

+ Encyclopædia Britannica: سیستەمیکی فکریە خاوەنی رەهەندی زانستیشە لە تیڕوانینەکانی بۆلیکدانەوەی بوونەوەر و چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەلگەو

+موسوعە لالاند: زانستی تویژینەوەی بنەچە بیروڕاویاساکانیەتی .

---

[1675] بەشیك ئەوە بە پیناس پۆلین ناکەن چونکە لەنامەیەکی ئەنجلس بۆ دۆهرینگ هاتوە ,بەلام دوای لە کتیبی(لودفیغ فورباخ ونهاية الفلسفة الكلاسيكية الألمانية )و (ایدیۆلوجیە الالمانیە)مارکس دووبارە بوویتەوە .

[1676] الموسوعة الحديثة للمصطلحات السياسية والاقتصادية ص68

+قاموسی حزبی بەعس: بریتیە لە زانستی بیرو بۆچونەکان (یان وەك ترجمەی کردوە بە —حديث الفكر)[1677].

+الموسوعة مصطلحات السياسية: هي ناتج عملية تكوين نسق فكري عام يفسر الطبيعة والمجتمع والفرد، ويحدد موقف فكري معين يربط الأفكار في مختلف الميادين الفكرية والسياسية والأخلاقية والفلسفية .

+ موسوعة المصطلحات والمفاهيم : علم الاجتماع السياسي أو في علم السياسة وهو جملة الآراء والأفكار والتمثلات المرتبطة بسلطة سياسية

ئەوانەی دژی ئایدیۆلۆجین پیناسیکی تریان هەلبژاردوە بە ناشیرینی پیشانی دەدەن وەك لەو دوو نمونەی خوارەوە:

+ المصطلحات السياسية الشائعة : هي العقيدة السياسة لحزب أو حكومة وهي مجموعة المبادئ السياسة والاقتصادية والاجتماعية والقيم الأخلاقية التي ينتهجها حزب أو حكومة حتى يستعان لتحقيقها وتنفيذها بالترغيب والإكراه والسير على هداها في الحاضر والمستقبل وتتميز بطابعها العلماني.

**ئایدیۆلۆجیە جیایەکان:**

دیتریس پینج توخمی بۆ ئایدیۆلۆجیا دیاری کردوە:1- توخمی لیکدانەوەی هەمەلایەن 2- بەرنامەیەکی بۆ دیاری کرابیت 3-هەولدان بۆ هینانەدی ئەو بەرنامەیە 4- پیویستی بە کۆمەلە خەلکیکە بۆ هەلسان بە جیبەجی کردنی ئەو بەرنامەیە 5- بەرنامەکە لە قازانجی جەماوەرە بەلام چینیکی وەك سەرکردە بۆ دیاری کردوە[1679]، هەرچی رای (مۆلیرنز)ئەو بیرو رایانە بە ئایدیۆلۆجیا هەژمار دەکرین ئەگەر ئەو چوار مەرجەی هەبیت: ( لە رووی لۆژیکیەوە هەماهەنگی نیوەخۆی

[1677] الموسوعة لالاند الفلسفية ص611

[1678] تعريفات ببعض المصطلحات ص147

[1679] Encyclopædia Britannica Article :idiology

هەبيت ، ڕێنمایی پیبدرێ ، بتوانرێ بە هۆیەوە هەلسەنگاندنی پیٚ بکری ،چوارەمیش توانای ئیقناعی هەبیت ) .

بەڕای هەندێ زاناو فەیلەسوف وخودی مەوسوعەی بریتانیش ئەوا لەسەر ئەو پینج توخمە دەتوانرێ ئایدیۆلۆجیە جیاجیاکانی وەك شیوعیەت ونازیەت وفاشیەت وئاینی وناشیۆنالیزمی ولبرالی ..لێك جیا بکەیتەوە ، بە پێی مارکسیەت ئایدیۆلۆجیای هەر تاك وکۆمەلەیەك ڕەنگدانەوەی ئینتمای چینایەتیەکەیەتی ، ئەگەر ئەو ڕەنگدانەوەش بە دروستی نەبوو لەو دۆخە پێی دەووترێ ئایدیۆلۆجیای نازانستی، کە تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەرە بە زانستی ئابووری ئەگەر چی واشی لیدەر نەکەوێ ،لەسەر ئەو بنچینەیە پیی وایەئایدیۆلۆجیای مارکسی لینینی زانستی تەواوە و گوزارش لە بەرژەوەندی چینی کریکار دەکات ، ئیتر چەندین جۆری تری ئایدیۆلۆجی دروست دەبێت لەسەر ئەو بنچینەیە ،لەوانە : ئلیدیۆلۆجیای برجوازی ئایدیۆلۆجیای نیشتمانی ،ئایدیۆلۆجی عەلمانی وئایدیۆلۆجی ئاینی ،نەتەوەیی وئومەمی...،زۆر جۆرە ئایدیۆلۆجیای ترهەیە بەلام سەرچاوەی هەمو ئەو ئایدیۆلۆجیانە لە چوار مەدرەسەی سەرەکی دێت کە بریتین لە ( لیبرالی- شیوعیە- سۆشیالیستی- ئاینی) بۆیە لەوانە دەست پیدەکەین :

**ئایدیۆلۆجیای لیبرالی :** لیبرالی لە ئایدیۆلۆجیەکی دیاری کراو پیکنەهاتوە ،بەلکو بریتیە لە شەبەنگێك تیۆر و فکر و ڕاڕەوی ئایدیۆلۆژیا و ئاینی و زانستی جیاجیا پێکهاتووە، زیاتر لە چەمکی عەلمانی بەرجەستە بوە ،بەلام مەرجیش نیە هەمو عەلمانیەك لیبرالی بێت ،مێژوویەکی تیۆری کۆنی هەیە (لەپێش زایین)، بەڵام پەیڕەو بوونی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری دا هەموو ئەو زانا و فەیلەسوف و مەدرەسانە دەگرێتەوە کە بەشدارن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕش بەسەر دەسەڵاتی کەنیسە بەتایبەتی فکری هۆبزو نیتچەو دیکارت و بیکۆن وڕۆسۆو فۆلتیرو ..تا دەگاتە دوورەکەیان لە سیاسەت کە (تیۆری (ئادم سمیس) وتوویەتی: بەختیاری گشتی دێتەدی کاتێك هەرکەس بەدوای بەرژەوەندی خۆی بێت، ئەوە یان لە ئابووری، (دورکایم و کرۆتچە) لە کۆمەڵایەتی و (سپینر) لە گەشەکردن (وجودیەکان) لەبارەی سەربەستیدا.. هەریەکە یان وەستای کارامەی ئەو ئایدیۆلۆجیەن .

دەتوانین بڵێین کۆمەڵگەی مەسیحی زیاتر لەو ئایدیۆلۆجیە نزیکە، هۆیەکەش سادەیە زیاتر لەگەڵ باری دەروونی ئەو جۆرە کۆمەڵگە دەگونجێ کە گونجاوە لەگەڵ ناوەرۆکی ئینجیل و نەریتی مەسیحیەت .

**ئایدیۆلۆجیای مارکسی :**بەدریژی لە چەمکی مارکسی باس کراوە لەو مەوسوعەیە..

**ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیستی:** ئەو ئایدیۆلۆجیەش زۆر کۆنە لە پیش سەرهەلدانی چەمکی ئایدیۆلۆجیا ئەو ئایدیۆلۆجیایە هەبوە ،دەگەڕێتەوە پێش زایین، نەچووبووە قاوغێکی داڕشتنەوە بەو شێوەیەی ئێستا تا لە سەدەکانی دوای (16) دەستی پێکرد، لە سەرەتادا زۆر جۆرە ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیستی گەڵاڵە کرا(سۆشیالیستی تۆباوی، سۆشیالیستی نەتەوایەتی، سۆشیالیستی دیمکراسی، سۆشیالیستی برجوازی، سۆشیالیستی نێونەتەوەیی، سۆشیالیستی ئاینی، سۆشیالیستی زانستی...).

لەدوایدا تەنها دووجۆرە ئایدیۆلۆجیا بوونە ئەزموون (ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیستی زانستی-ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیستی دیمکراسی)، دیارە سۆشیالیستی زانستی هەر هەمان ئایدیۆلۆجیای مارکسی هەیە ، بۆیە تەنیا باسی سۆشیال دیمکرات دەکەین:

ئەو ئایدیۆلۆجیە لەلایەن فەیلەسوفانی وەك (فۆرییێ- 1772)، (سان سیمۆن 1760-1825)، (لاسال 1825- 1864)، (برنشتاین 1850- 1932)، (کاوتسکی 1854-1938).. گەشەی پێدراو پیادەکرا،،لەلایەن هەردوو مەدرەسەی مارکسی وسەرمایەداریش هیرشیان کراوەتە سەر مارکسیەکان(بەتایبەتی لینین) بە دوو ڕوو وەسفیان کردوون،هەرچی بەرەی سەرمایەداریە (بەتایبەتی وەسفی تۆکفیل)دەلێ سۆشیالیستی ودیموکراسی تیکەل نابن ،لەدیموکراسی ئازادی ومەخەیەری لە سۆشیالیستیا موقەیەدی وموسەیەری،بەلکو دژی یەکن مەگەر لە یەکسانی بگەنەیەك[1680]، ئەوانە بەکورتی پێیان وایە بۆ گەیشتن بە دادگەری کۆمەلآیەتی و گواستنەوەی سەرمایەداری بۆ سۆشیالیستی بەڕێگەی ئاشتی و پرۆسەی دیمکراسی و چاکسازی ئابووری دەبێت، لەسەردەمی جەنگی ساردو گەرمەی مارکسی دەیان ووت جیاوازیمان لەگەل مارکسیەکان ئەوەیە ئیمە بە ئاشتی ودیموکراسی سۆشیالیستی پیادە دەکەین ،لە شکستی شیوعیەت 1990

[1680] لەبارەی ئەو ڕایانەی توکفیل بڕوانە: فریدریك ئای هایك- الطریق الی الرق ص39

بەدواوە سۆشیال دیموکراسەکان زیاتر بەرەو کۆمەڵگە و نەریتی لیبرال دیمکراسی و سیستەمی سەرمایەداری لاربوونەوە ،گەڕانەوە سەر ئایدیۆلۆجیای برنشتاین وتەواو جیا لە ئایدیۆلۆجیای مارکسی ونزیك لە سەرمایەداری ،برنشتاین دوای هەلگەرانەوەی لە مارکسی لە کتیبەکەی (الاشتراکیة النظریة والاشتراکیة الدیمقراطیة التطبیقیة) ووتی (ئەو قەیرانانەی لەسەرمایەداری ڕوودەدا نابیتە هۆی ڕووخانی و جیگرتنەوەی پرۆلیتاریا، ووتی سۆشیالیستی دیموکراسی لە چوارچیوەی سیستەمی سەرمایەداری دەبێت[1681] .

**ئایدیۆلۆجیای ئاینی :** ئاین دەقە ،پەیامە،ئەو کاتەی تیگەیشتنی پیاوانی ئاینی (قەشەومەلاو حاخامو..)لێی دەبێتە فقه، ئەو کاتەی تیگەیشتنی ئەکادیمیای لێی دەبێتە زانستی ئاین، ئەوکاتەی تیگەیشتنی فەلسەفەی سیاسی لێی دەبێتە ئایدیۆلۆجیای ئاینی ، ئەو ئایدیۆلۆجیەش قوولە ،دەڕواتە بوونەوەر وقوولایی گەردوون، پێیان وایە یەزدان ئەو بونەوەرەی بەبینراو و نەبینراوەوە هەر لە ئەلیکترۆنێکەوە تا گەردوون بەپێی یاسای توندوتۆڵ (مسەیەر کراو) دروست کردووە، بەهۆی (خلق و تدبیر) یان (خلق و امر)، مانای دروست کردن و بەرنامەداڕێژی (کە دەکاتە یاسا)، هیچ شتێك ناتوانێ لەو بەرنامەیەی بۆی دانراوە لابدا، یان یاخی ببێ، مسەیەرە ،تەنیا ئادەمیزادە ئەو برە سەربەستیەی پی دراوە[1682]، ئەویش لایەنە بەشەریەکەی (مخیر)ەو خۆی بەرپرسی کارو کردەوەکانیەتی، ئەوەش مادەکانی ئیمتیحانەکەیەتی، جا پەیامی ئاینی بریتیە لە درێژکراوەی ئەو کۆمەڵە یاسایانەی بوونەوەرکە هەمان خاوەنی هەیە، ئەگەر ئادەمیزاد پەیڕەوی ئەو یاسانە(شریعەت)ی کرد لە حوکم و ئابووری و معاملات و پەیوەندی.. ئەوا هەم لەسەر دنیا بەدادگەری و بەختەوەری دەژی و هەم لە ئیمتحانەکەش بە سەرکەوتوویی دەردەچن، ئەگەر لەجیاتی بەرنامەی تری دەستکردی پەیڕەو کرد، ئەوا هەم لەسەر دنیا ناگاتە ئامانج و دادگەری و ئاسودەیش نابینێ و دەبێتە کارەساتی کۆمەڵایەتی لە چەوسانەوە و دەستدرێژی و جەنگ و برسێتی ،.. هەر بەرنامەیەکی تری بەدیل هەردەم (سەتحیە، یەك لایەنە، کورت بینە، مەودا کورتە، قووڵ نیە، ئەنجامی لێك نەدراوەتەوە، چەسپاو نیە، محلیە، وەختیە،... ناگونجێ لەگەڵ ڕەوشت و ڕسکانی

---

[1681] بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بروانە : فرانسوا شاتلیة، دوهامیل،بیزلیة- معجم المؤلفات السیاسیة ص180-

[1682] ئادەمیزاد و شارستانیەتی جن ئیختیارن، بەڵام بابەتەکەی ئێمە ئادەمیزادە.

ئادەمیزاد و یاساکانی بوونەوەر ،.. بەشەکانی ئەو بەرنامە خۆبەخۆ ناکۆکن، چ جای پەیڕەوکردن و پیادەکردنەکەی ،.. ) ،لەسەر ئاستی بوونەوەریش ئایدیۆلۆجیەکانی زادەی مرۆڤ بەوە دەناسنەوە کە ناتەبایی و سەنتەر نیە بەیاساکانی سروشت ( یاساکانی میکانیکی و فیزیایی و کمیایی و جیولوجی و بایولوجی و فیسیولوجی و سوسیۆلوژی -کۆمەلایەتی و ئەنژوپۆلوجی — کۆمەلناسی و سایکولوجی -دەرون ) ، لەو بەراوردە بیری سیاسی وئایدیۆلۆجیای ئاین دروست دەبێت لە عیبادەتەوە بۆ کاری سیاسی وفکریش.

**ئایدیۆلۆجیای بێئایدیۆلۆجیا** ..تەیاریکی نوێی بەهێزە ،هەمو ئەوانە دەگرێتەوە کە دژبە ئایدیۆلۆجیان،ئەوەش بە ڕاڕەویکی ئایدیۆلۆجی هەژماردەکرێت ،لەکۆنەوە زۆربەی ئەوانەی بە لیبرالی وتەغریبی هەژماردەکرێن تاڕادەیەکی زۆر رێك نین لەگەل ئایدیۆلۆجیا ، ئەوانە زیاتر لەو ڕوە لاوازن ، هەر بۆیەش لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو دەنگی (کۆتایی ئایدۆلۆژیا) بەرەبەرە بەرزکرایتەوە، ئەوان لە ڤاکتەرەکانی سیاسی و ئایدۆلۆجی و فلسفی و ئاینی و فکری بەگشتی لاوازن.
سەربردەکەی لە شۆڕشی فرنسا دەست پیدەکات،واتە لەگەل سەرهەلدانی چەمکی ئایدیۆلۆجیا چەمکی ئەنتی ئایدیۆلۆجیاش بەرێکەوتوە ، بەتایبەتی وەرچەرخانی ئایدیۆلۆجیا لە شۆڕشی فرنسی بۆ ئامرازیکی کوشندە، هەموو توێژینەوەکان یەك ڕان کە لە دوای شۆڕشی فەڕەنسی 1789 ئایدیۆلۆجیەکی سامناك هاتووە کاتێ (ڕۆبپسپیر، گۆستو، گۆدون) لە 2 سالّی فەرمانڕەوایان بە ناوی دروشمەکانی شۆڕش و ئازادی کۆمەلێك فەرمانی (تێرۆرانەیان) جاڕدا، بەسەردێری (شمشێری یاسا لەسەر ملی تاوان باران) لە دژی ناحەزانی شۆڕش ،یان ڕاست تر بلێین وەك ئێستا ئاسا (لە دژی دەسەلاتی خۆیان) کە بەڕەسمی لە ئەنجومەنی نیشتمانی ودەزگا مەدەنییەکانی فەڕەنسی داڕژا، پێیان دەوترا (پەیڕەوانی ئایدۆلۆژیای چاکۆپیان)، لە دوای کەوتنی (ڕۆپسپێر) بە (2) ڕۆژ لە 1792/7/29 لە گۆڕەپانی شۆڕش بە تاوانی (تیرۆریزم) لە سێدارەدرا بە هەمان ئەو (مەقسەلەی) کە هاولاتی و تێکۆشەرانی پێ لە سێدارەدەدرا،..لەوەوە ناوناوبانگی ئایدیۆلۆجیا خراپ لەکەدار بوو .

لەو دواییەش لەگەل کەوتنی سەربازگەی سۆشیالیستو سۆڤیەت وئەزموونەکانیان لە کۆتایی سەدەی

ڕابووردوو دیسان ناوناوبانگی ئایدیۆلۆجیای زڕاندەوە،ئەو بارە فکری و دەولیەی بۆ (ڤۆکۆیاما)و داڕێژەرانی ئەو تیۆرە دروست کردووە، کە جاڕی کۆتایی مێژوو لەسەرمایەداری بدەنەوە ...لە گەلیشدا جاڕی کۆتایی ئایدۆلۆجیاش داوە، دوای بەرپا بوونی هەندێ بزوتنەوەی ئیسلامی ئایدیۆلۆجی توند زۆر ئەو تیۆرەی فۆکۆیامای موکوم کرد.

**ئایدیۆلۆجیای نەتەوەیی :** بوون لە نەتەوە ئینتمایەکی ستونیە ،نابتە ئایدیۆلۆجیاو سیاسەت وناسنامەی مرۆیی ،مەدرەسەی سەربەخۆی نیە، تشریعات و تێڕوانین و هەڵوێستی گشتی نیە، ئایدۆلۆژیا نیە،بۆیەش حیزبێکی نەتەوەیی (هەتا شۆڤێنیەکانیش) بە هۆی مەدرەسەیەکی فکری ئایدیۆلۆژی نەتەوەیاتی پێ تەواودەکا، بە ئایدیۆلۆجی کردنی نەتەوایەتی ئەزمونیکی پڕ مەترسی بوە لە میژووی نوێ و کۆنی کۆمەلگە ، نازی وفاشی وتۆرانی وبەعسی و.. زۆر جۆری تر سەری هەلدا کارەسات وجینۆسایدیان بەرهەم هێنا ،نەتەوەی باڵادەست نەتەوەی بچووکی داگیرکرد بە خێڵ و بنەماڵەوە.

جاریش وایە ئایدیۆلۆجیای نەتەوەیی چەمکیکی تر وەردەگرێ ،ئەویش ئومەیە ، یان بە نەتەوەیەکی سیاسی وتراوە ئومە(واتە : ئومە = نەتەوە +ئایدیولوژیا )، لە ڕووی یاساییەوە بە میلەتانیك وتراوە ئومە کەدەولەتیان هەبووبی..بەکورتی بە ئایدۆلۆژی کردنی (واتە: القومیە+ الایدولوجیە = الامە، بەپێی ڕای نەتەوەییەکان)، ئەوە بووە مایەی سەرئێشەو ڕەگەزپەرستی و داگیرکردنی لێهاتەدی ،لەسسەر ئەو بنچینەیە هەستی نەتەواتیەتی و ئایدیۆلۆژی نەتەوایەتی لێك جیادەکەنەوە .

ئایدیۆلۆجیاو ئاین وحزب

تا ڕادەیەك تۆینبی لەبارەی جیاوازی نێوان ئاین وئایدیۆلۆجیا قسەی کردوە ،پێی وایە ئایدیۆلۆجیا لەسەروو دروست دەکرێت بۆ خواروو دەنێردرێت ،بۆیە تایبەت دەبێت بە چینیکی دەست ڕۆیشتوو ،واتە خەلکی لەسەر ئایدیۆلۆجیای شایەکانن ،ئەوەش هەمان مانای فەرمودە(الناس علی دین ملوکهم)دەگرێتەوە هەروەك لە کتیبی ( الحضارة الغربیة الحدیثة)وای تێگەیشتوە[1683]،لە ڕاستیدا یەك

[1683] د صفاء عبدالسلام - الحضارة الغربیة الحدیثة بین النشأة والتدهور (عصر ایدیلؤجیات) ص17 .

راست کردنەوە بۆ ئەو کتێبەو بۆ زانای گەورە (تۆینبی) فەرمودەکە شیکردنەوەی لۆجیکی دەوێت ،نالیت( الامە علی دین ملوکهم )بەلکو دەلێ (الناس)،واتە خەلکی عەوام ورەشۆکی نەك کۆمەلگەیەکی مەدەنی .

لەپیناسەکانی سەروو وئایدیۆلۆجیە جیاکان دەردەکەوێ زۆر جۆرە پیناس و مانای پیدراوە، بەلام مانای راستەوخوی زاراوەکە بریتیە لە زانستی هزر ،هەرچی مانا زیاتر بەلای کومەلە زانست و زانیاری و قوول بۆ پرسەکان دەدا ئەوەی دوای تاك و کۆ دەگریتەوە، بەزاراوە تەنها دەمێنی لەتاکەکەس هەرجی بەشە چەمکیەکەی ئایدیولوژیا زیاتر دەستەو تاقم و حزب و کومەلەی تریش دەگریتەوە، لەو ڕووەوە کەمتر قاموس ومەوسوعەکان بەلای ئەو لێکجیاکردنەوەیە چووینە ، فەرهەنگی ئۆکسفۆردی سالی 2010 ئەو بەشە ئایدیۆلۆجیەی تاکگەرایی بە(بیلیڤی- bilive) گوزارش کردوە- لەکوردی بەتاکگەرایی ووتراوە (زکگورتی) لەناو عەرەبی عیراقیش بە (زکرتی)ناوزەد کراوە بەلام نازانین کامیان لەکامیان وەرگیراوە[1684]، زۆر جاریش هەیە وەك هاوتا بو ئاین بەکاردەهینریت وەك لەسەروو لەهەندێ پێناس دیاری کرا ، بەجۆریك ئەگەر زانیاری ئاینی فقهە بێت و زانیاری بەشەریش ئایدۆلۆجیا بیت ،ئایدولوجیا زانستی واقعی و پیادە دەبییت، زانستی ئاینیش بوتاکە کەسەولە چوارچیوەی میسالیە ،ئەوەش بناغەی هەرە خوارەوەی لێك جیاکردنەوەی ئاینە لە زانست وسیاسەت و شارستانی، لەکاتیك ئایدولوجیا مەرج نیە هاوتای ئاین بیت، ئایدۆلوجیای ئاینیش هەیە ،ئەوەی وا دەزانی بەرهەمی بیری بەشەری ئایدۆلۆجی دروست دەکا ئەوا وا دەروانیت ئاین باسی دونیا نیە،تەنیا هەوالی پیش هاتن و روژی دوایی هەندی پرسەی تری میتافیزیکی بیت ،ئەوەی ئەوبوچونە پتە وتر دەکا رای هەندی فەقیهو ئاین پەروەرە،کە تەواوی زانستی بەشەریان بە (علمی شەیتان ) وەسف کرد، لەکاتیکدا هەرچی علم هەبی هەر خواپیداوە، هەندیکیشی راستە لەوسەردەمە زیاتر ئایدۆلۆژیا بۆ ئەوکەسانەیە کەقسە لەسەر گەردوون و فلسەفەو زانستی قوول دەکەن ،تارادەیەکیش دەیبەستنەوە بەسیاسەت وچارەسەریەکان بەو قولاییە دەبیتەوە

---

[1684] بۆ زیاتر لةبارةی (زکرتی )بڕوانة :سعد سلوم-السیاسات والاثنیات فی العراق(منذ الحکم العثمانی حتی الوقت الراهن) ص57

حزبی ئایدولوجیا، زیاتر ئەو مانایە دە بەخشیت کاتێ پشت بەستوە بەیەکی لەو چوار مدرسە 1 شیو عیەت 2 سوشیال دیموکراسی 3 لیبرال دیموکراسی 4 ئاینی.

هەرچەندە ئیستا بەرەو ئەو ئاسۆیە دەرۆین کە ئەو حزبانەی سە ر مدرسەی سوشیال دیموکراسی و لیبرال دیموکراسی بێت کەم تر خاوەنی ئایدولوژیا دەمێنی ،ئەوانەش دووبەشن ئەوانەی لە ولاتانی سەرمایە دارِیین کومەلگەکەیان تا ئەو رادەیە مەدەنیە کە تاك ئەوەندە خورد بویتەوە پەیوەندی بەخیزانیش زۆر لاوازە، هەریەکەو بەدوای بەرژەوەندی خویەتی ،ئەوا ئەو جورە حزب و تەیارانەی ئەو شوینانە کەم تر پیویستیان بە ئایدیۆلوجیای دەبی ،کەم تر شیوازی حزبی جەماوەری وەردەگری، بەلکو دەبتە کیانیکی یاسایی زیاتر لەوەی سیاسی بیت ،بەپێی بەلینی جەنتلمانی وزارەکی بەخەلکی دەدا ، بەرنامەکانی هەلبژاردنی منافسەش لەسەر ئایدولوجیایا نابیت، زیاتر لەسەر ناسنامەی خزمەت گوزارانەی بەرژەوەندی تاکەکەس دەبیت ،هەرچی حزبی لەوجورەی جهانی سییەم ئەو شیوازە وەرناگری پیویستی بەبنکەو ناوەندو سەرکردایەتی دروستکردنەپیویستی بەجەماوەر و ئایدیۆلۆجیا هەیە.

ناسنامەی حزب زیاتر واباوە بەو نیشانانە دیاری دەکرێت : 1- سەرکردەو کەسایەتیە بەکارەکانیان. 2- ناسنامەی هەر حزبێك لە مەدرەسەکانی فکری و سیاسی جیهـانی.3- ئـەو گۆڕانکاریـە فکریانـەی بەسـەر ئـەو ناسنامەیەدا هاتووە.4- خالە لاواز و بەهێزی هـەر حزبێـك لـە سەرتاسـەری ڕەوتیانـدا.5- ئـەو گیروگرفتانـەی ئێستایان لە هەورازی عەولەمەدا...,کەمتر باسی ئایـدیۆلۆجیا کـراوە لـەو سـەردەمە کـە بنچـینەی پیکهـاتنی ناسنامەی حزب بێت،لەکاتیکا حـزب لەگـەل بارسـتە بەشـەریەکانی تـری کۆمەلایـەتی بـەوە لیکجیادەکریتـەوە کەلەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆجیای وەرگیراو دروست دەبن ، بۆیەش هەم حزب وهەم تەواوی ئایدیۆلۆجیاش لە پـۆلی فاکتەرە ئاسۆییەکانە نەك ستونی .

جاروایە ئایدیۆلۆجیەکی تەسك پەیرەو دەکرێت دەکرێتە پێوەر بۆتەواوی ئایدیۆلۆجیا بە ئلیدیۆلۆجیە فراوەنەکانیشەوە ، ئەوەی یەکەم سەلبیە بەلام ناتوانرێ ئەوەی دوەم وا بە ئاسانی بە سەلبی پۆلین بکرێت ،لە کتیبی (قانون الشعوب)بە ئاڕستەیەکی تری لیکدایتەوە ودەلێت: جار وایە ئایدیۆلۆجیا بە ڕاڕەویك کە خاوەن دیدێك بیت لیکدەدریتەوە ،بریتیە لە کۆی( conception & doctrine) واتە کۆی

چەمك وڕای سەرتاپایی، کاتیٚ (دۆکترینۆ- doctrino)بەمانای رایەکی سەرتاپایی ،زاراوەی (چەمك -conception ) تیڕوانینی سیاسی بیٚت [1685].

قانون الشعوب ص229 [1685]

(60)

**ناسنامە-** **الهويە** Identity

ئەوانەش دەگریتەوە (کۆسمۆپۆلۆتی، هويات عملاقە، سۆویت ، دەولەتی شار،ايام العرب، ..)

لە چوارچێوەی جیاوازیەکانی شت ومەکەکانی بوونەوەر بە کۆمەلگەو مرۆڤیشەوە هەندێ جیاوازی بنچینەن وهەندیکیش ڕووکەش، ناسنامە بریتیە لەو جۆرە جیاوازی وتایبەتمەندیەی کە رەگەزێك لە رەگەزونەژادیکی تر جیادەکاتەوە ،لەناوئەورەگەزو نەژادوتوخمەش دیسان سیفاتی تایبەت هەیە کە ئەو کیان لەوانی تر جیادەکریتەوە پێی دەووترێ ناسنامە،جاران مەبەست لە ناسنامە بەماناسادەکەی ئەو مواسفەتانەی بۆ مرۆڤیك لە کارتیك دیاری دەکرا لە ناوو ورەنگ وجنس وهەندێ وەسفی تایبەتی تری خۆی دەوترا ناسنامە ،لەدوای سەرهەلدانی بیری نەتەوەیی و دوایش دەولەتی نیشتمانی ئەو چەمکە فراوانتر بوو باس لە ناسنامەی نەتەوەی ونیشتمانیش کرا ،لەگەل سەرهەلدانی عەولەمە باس لەناسنامەی شارستانی وئاینی وفەرهەنگیش کرا ، هەلبەتە توێژینەوەکان لێرەوە لیکجیادەبن ، بەهۆی ئەوەی هەرلاو مەدرەسەو تەیارێك بە ڕوانگەی تایبەتی خۆی دەڕوانیتە سیفاتە تایبەتیەکان ،بۆیە پیناسی جیاجیا بۆ ناسنامە کراوە ، بەلام پیش ئەوەی بێینە سەر پێناسەکانی پێویست دەکا گەشەی ئەو چەمکە دیاری بکەین ،کە دەکا ناسنامەی ناسنامە خۆی دیاری بکەین .

<u>سەرهەلدانی چەمکی ناسنامە</u>

لەکۆنەوە دوو ناسنامەی جارنەدراوی پیچەوانە هەبوو ،یەکیان زۆر دەڤەری دوەمیان جیهانی (یان ووردتر کیشوەری)،بۆ دوو چینە کۆمەل ،یەکەمیان زیاتر گشتی بوو وەلامی پرسیاری بنچینەی مرۆڤ بوو کەلەکاتی یەکتر ناسین (ئەتۆ کێی؟) ناسنامەی خۆی بە بنەمالەو خیل و زێدی خۆی گوزارش دەکردو ناسنامەیەکی دەڤەری بوو ، ڕەهەندی سیاسیەکەی بریتی بوو لە دەسەلاتیکی سیاسیی ئاستی میرنشین یان دەولەتی شار ، زۆریش بلاو بوو وزۆرترین بەکارهێنانی هەبوو ،ئەوەی دوەم کەم بوو بەلام گرنگ بوو تایبەت بوو بە سیستەمی ئیمپراتۆریەکان، دوای هەردوو ناسنامە بەرەو

(61)

**هاوپەیمانیە نێو دەوڵەتیەکان**          **تحالفات الدولیە**          alliance

**ئەوانەش دەگرێتەوە( ناتۆ، هاوپەیمانی وارسۆ، هاوپەیمانی داخراو، حلف مقدس، هاوپەیمانی کراوە ، حلف سەنتۆ، حلف بغداد، ترتیب الاولویات، هاوپەیمانی ستراتیژی** ، وولاتانی هاوپەیمان،**ماترینختی، مارکۆزی،..)**

هاوپەیمانی بەفراوانی مانای لێك نزیك بوونەوەی دوولا یان زیاتر بۆ هێنانەدی چەند ئامانجیکی هاوبەشە لەسەر حیسابی سێیەم،عادەتەن ئەو هاوپەیمانیانە لە چوارچێوەی ڕێکەوتنامەیەکی مۆرکراو دێتە دی ،یان بە گوزارشیکی تر هەمو هاوپەیمانیەك تەکەتولە دژبە تەکەتولیکی **تر**،لەو سەردەمە زیاتر مەبەست لەهاوپەیمانی دەولیە کە کۆمەڵێك(لەدوو کەم تر نەبێت) دەوڵەت لە دەوری تەوەرێك کۆدەبنەوە، بە جۆرێك لە جۆرەکان تەکەتول دروست دەکەن لە هەڵوێست و هەنگاو دژ بەلایەکی تر کە عادەتەن ئەویش هاوپەیمانیەتێکە یان هێزێکی گرنگە،بەو مانایەی ڕەنگە یەکەم جار لە جەنگی جیهانی یەکەم هاوپەیمانی دەولی سەری هەلدا بێت .

زۆر جۆرە هاوپەیمانی بچوك وگەورەو دەڤەری وجیهانی هەیە ،ئەگەر لەسەر چەند رەهەندیکی فراوان هاوپەیمان بوو ئەوا پێی دەوترێ هاوپەیمانی کراوە ،ئەگەر لەسەر یەك ڕەهەندی وناوەخۆیی بێت ئەوا پێی دەووترێ ( التحالف المغلق Closed Coalition ).هاوپەیمانی ترهەیە دیپلۆماسیەو هەیە

سیاسی وئابووریە وهەرە سەختەکەی هاوپەیمانی سەربازیە ،زۆربەی جار ئەو هاوپەیمانیەتیانە لە سەروبەری هەلگیرسانی جەنگ دروست بووینە ،واتە خودی هاوپەیمانی مانای تیکدانی ئارامیە بەتایبەتی لایەنە سەربازیەکەی،بە مانا ئاینیەکەی زۆربەی جار هاوپەیمانی دەولی (تعاون علی الاثم)ە ..جۆرە هاوپەیمانیەکی ترهەیە بۆ هاریکاری وگەشەو خزمەتگوزاری پێی ووتراوە (کۆنفیدرالی)،بەو شێوەیە کۆنفیدرالیش جۆرە هاوپەیمانیەکە .

پێناسەکانی هاوپەیمانی دەولی : بە پێی (موسوعە السیاسیە) یەکەم هاوپەیمانی کە ئەوناوەی هەلگرتبێ لەسەر ئاستی دەولی ئەو هاوپەیمانیەی (فرنسا -بریتانیا -روسیا -ئەمریکا ) لە جەنگی جیهانی یەکەم وناویشیان بوە (وولاتانی هاوپەیمان) لەبەرامبەر وولاتانی تەوەر(ئەلمانیاو هاوپەیمانەکانی )[1741]، ئیتر ئەو زانستە بنیات نرا ..
پێناسی زمانەوانی : لەکوردی بە هاریکاریەکی قوولتر بەرامبەر دوژمنەکی هاوبەش ووتراوە هاوپەیمانی .

(قاموس المعانی) : اتحاد من أجل مصالح مشتركة.

+پیناسی زاراوەیی لە( معجم المعاني الجامع - معجم عربي عربي): : تَعَاهَدَا فِيمَا بَيْنَهُمَا ، اِتَّحَدَا ، صَارَ بَيْنَهُمَا حِلْفٌ

پێناسی یاسایی: پەیوەندیەکی گریبەستی فەرمیە لە نێوان دوو ولات یان زیاتر بۆ پالپشتی یەك کردن لەکاتەکانی پیویست .

+پیناسی سیاسی: هاوپەیمانیەکی مۆرکراوە لەنێوان دوو دەولەت یان زیاتر تیایدا هەردوولا پابەند دەبن پێی لە ئاستەکانی سیاسی وسەربازی ودیپلۆماسی.

+پیناسی ئۆزگۆد: اتفاق رسمي تتعهد بموجبه مجموعة من الدول بأن تتعاون فيما بينها في مجال الاستخدام المشترك لقدراتها العسكرية ضد دول أو دولة معينة، كما تلتزم بمقتضاه الدول الموقعة باستخدام القوة أو التشاور باستخدامها في ظل ظروف معينة.

---

[1741] الكيالی- موسوعە السیاسە ج2 ص 571

+ ديڤيدئەدوارد :التزام مشروط ذو طابع سياسي أو عسكري بين مجموعة من الدول باتخاذ التدابير التعاونية في مواجهة دولة أو مجموعة دول[1742] .

+جۆزيف دۆنەر: هو علاقة تعاقدية بين دولتن أو أكثـر، يتعهـد بموجبها الفرقاء المعنيون بالمساعدة المتبادلة في حالة الحرب[1743].

المصطلحات السياسية السياسية الشائعة : من ناحية القانون الدولي علاقة تعاقدية بين دولتين أو أكثر يتم من خلالها اتخاذ خطوات الدعم المتبادل في حالة حدوث حرب ، تلتزم كل منها بموجبها بتقديم الدعم السياسي والعون العسكري، إلى الطرف الاخر.

هاوپەیمانیە سەرەکیەکان:

بنەمایەکی دەولی زۆر بلاو هەیە دەلێ ئەگەر یەك کەس هەبوو ئەوە ئاشتی هەیە ،ئەگەر بوە دوو ئاشتی تێکچوو ململانێ سەرهەلدەدا،ئەگەر بوە سێ هاوپەیمانیشی لەگەل دروست دەبێت ،ئەوەیان رێك لەگەل رێساکەی (مارکۆز) دێتەوە کە دەلێت:(پێك گەیشتنی دوو بەرژەوەندی دەبێ جیا بێت لەگەڵ سێیەم) ،بەو شێوەیە سەرچاوەی هاوپەیمانی لە ئەنجامی تیکچوونی ئاشتی وئارامی دێت ،لە بێمتمانەیی دێت،بەشێکە لە پلان وپێلان ،هەربەو ڕوانگەش هاوپەیمانی میژووی کۆنی هەیە لەگەل هاتنی بەشەریەت ،لەسادەوەو ئاستی تاکی ئینجا بۆ ئاستی بنەمالەو خیل و تا دەگاتە دەولی ، هەر لەسەر ئەو بنچینەیە (ئەوەی پیێی دەووترێ تیۆری ماترینخت) سەرهەلدەدا ،پیێی وایە ئاشتی ئەوکاتە دێتەدی کەهاوسەنگی هێز هەبیت نەك لاسەنگ ، لەوەوە پیویستی دروست کردنی هاوپەیمانی دەبێت ،ماترینخت بە کرداریش سەرکەوتوو بوو لەدروست کردنی چەندین هاوپەیمانی بۆ ئەو مەبەستەو تیایدا نەمسای(وولاتی خۆی)تیا مەلبەند بوو .

---

[1742] ئەو دوو پیناسە لە کتیبی (الاحلاف والتکتلات الدولیە) وەرگیراوە

[1743] JOSEPH DUNNER -DICTIONAY OF POEITICAL SCIENCE VISSION PRESS LTD, LONDON 1965 P/6

.

لەسەردەمی نویٚ کۆن ترین هاوپەیمانی و فراکسیۆنی نێودەوڵەتی کە کاریگەری مابێت تا ئیستا (خانوادەی ئەوروپی)کە لەبنەچەدا دژ بە مەترسی ئیسلام دروست بوە ، تەقەلای یەکبوونی ئەوروپا زور کونەپەیوەندیدارە بە ریکخستنەوەی مالی مسیحی، لیبنتز داوای کرد پاپاو ئیمپراتۆرەکان بەو رۆلەی یەکخستنی ئەوروپا هەلسن، هەرلەدوای جەنگی سی سالەی ئەوروپی لە 1523 لەلایەن (ئیمریك کروچیە) ئەو داوایە کراوە، دوایش لە 1548 لە ویستیفالیای روژئەوای ئەلمانیا بناغەی خانەوادەی ئەوروپی پیك هات، ئەوەندە بەهێز بوو لەسالی 1856 دەولەتی عوسمانیش چویتە نێوی[1744] ،ئیتر ئەوروپا مەلبەندی هاوپەیمانی بوە چ دژ بە خەلکی تر چ دژ بەخۆبەخۆ،سەرەتای چالاکی دیپلۆماسی سەردەمیش بۆ ئەوسا دەگەڕێتەوە ، یەکەم جار کاردینال (ریشیۆ)وەزارەتی دەرەوەی بۆفرنسا داهێنا لەسالی 1621[1745]، لەسەرەتا هاوپەیمانیەك لە نیوان بریتانیاوسویدو هۆلەندا دژی لویسی 14ی فرنسی ، لەسالی 1717 دیسان بریتانیاو فرنسا وهۆلەندا نمسا هاوپەیمانیەکیان دروست کرد،[1746] ،تائەو ڕادەیە نەخشەی هاوپەیمانەکان دەگۆڕان بۆیە ژمارەی بۆ دووبارە بوونەوەی هاوپەیمانیە ئەوروپیەکان دیاری کرا بەتایبەتی لەنێوان فرنساو بریتانیاوروسیاو نەمسا ،لەهاوپیمانی پینجەم فرنساو نەمسا دژبە روسیا گەیشتە ئەو ڕادەیەی ناپلیۆن کچی ئیمپراتۆری نەمسای مارەکردو بوونە خزم ، لە هاوپەیمانی شەشەم لە بریتانیاو روسیاو نەمسا دەبنەوە دژ بە فرنساو جەنگی 1813 ڕوودەدا ،لە 1814 پەیماننامەی فۆنتیپلۆی مۆرکرا دژی ناپلیۆنی فرنسی ..لەگەل زۆر جۆرە هاوپەیمانی تر، لە سالەی 1879ئەلمانیاو نمساومجروبریتانیا هاوپەیمانیەکی تریان دروست کرد،هاوپەیمانیەکی تر بە ناوی (حلف مقدس) لەلایەن روسیاو نەمساو پروسیا مۆرکرا لە چوارچێوەی یەك ئاینی مسیحی وپاریزگاری لە تەختی پادشایەتی وبەهای مسیحی بەرامبەر هەرەشەکانی گۆڕان،دوای هەمو ئەوروپا هاتنە نێوی جگە لە شای بریتانی و سولتانی عوسمانی و پاپای مسیحی ،ئەو هاوپەیمانیە تا پیش جەنگی جیهانی یەکەم پاریزگاری لێکراوە وەك سەرۆکی

---

[1744] -بۆ زیاتر لەبارەی چوونی عوسمانی بۆناو خانەوادەی ئەوروپی بڕوانە: أ.د.وهبة الزحيلي-الفقه الأسلامي وأدلته - ط4/2004 ج8 ص 6305 .

[1745] جوزيف سيراكوسا-الدبلوماسية-ت:كوثر محمودمحمد،ط1 2015، مؤسسة هنداوي –قاهرة ص14.

[1746] بۆ ئەو هاوپەیمانیانە بروانە : الموسوعه العربيه الميسره ج2ص930

فراكسيۆنی كاديت(دەستوريەكان)لە 26 /7/ 1914لەناو دۆمای روسيا ووتی (إننا لا نقدم شروطًا أو مطالب، ولكننا نلقي في كفة الميزان بكل إرادتنا الحازمة للانتصار على العدو، وأصبح التحالف المقدس في روسيا عقيدة رسمية..)[1747] ،بەلام پتەودريژترين هاوپەيمانی (بريتانياو روسياونمساو پروسيا ەفرنسا) بوو تا جەنگی جيهانی يەكەم، ،لەولايەش سەرهەلدانی هاوپەيمانيەكی ئەلمانی وعوسمانی ودوای نمساو مەجەر ، دواجار هاوپەيمانی دەولی بەفەرمی لەجەنگی جيهانی يەكەم ودوەم دروست بوو دژ بە وولاتانی تەوەر، هاوپەيمانيەكە پيكهاتبوو لە (بريتانياو فرنسا و ئيتاليا وبلجيكيا )كەوتنە بەرەيەك بەناوی هاوپەيمانان دوايش ئەمريكاش هاتە نێوی ،بەرەی بەرامبەريش پيكهاتبوو لە( ئەلمانياو مجر ونەمسا وبلغاريا) بە ناوی ولاتانی تەوەر لە دوايدا لە1914/11/5 عوسمانيش كەوتە بەرەی تەوەر [1748]، ئەگەر بڕوانينە هيزی ئەلمانيا (11مليۆن سەرباز،5مليۆن ونيو مجند،4100 زرێپۆش،3900فرۆكە) باشتر لەهۆكارو ئامانجی هاوپەيمانی دەگەين .

---

[1747] ليون تروتسكی –تاريخ ثورة الروسية ج1ص35

[1748] - لة (معجم الحروب ص290-291 ) و هةروةها لة (الاسلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثة )

ئةو ئامارانةی هيزی هةردوو بةرةی تيَداية : 1- دول المركز (أو الوسط):

+ المانيا: ...،...، 11 مجند، ...،..5، 5 مقاتل، 4100 دبابه 3900 طائرة.

+ مجرو نمسا: ..،..8، 7 مجند، ...،..9 مقاتل

+ تركيا : ...، 850، 2 مجند ... 490 مقاتل

+ بلغاريا: ... 200، 1 مجند ... 380 مقاتل

2- دول الحلفاء :

+ بريطانيا: 6000000 مجند، 1700000 مقاتل، 610 دبابة، 1700 طائرة.

+ فرنسا: 8300000 مجند، 2600000 مقاتل، 2300 دبابة 3600 طائرة، 100000 الية مختلفة، 630000 حصان.

+ امريكا:3800000 مجند، 1800000 مقاتل، 90 دبابة، 740 طائرة

+ ايطاليا: 5.615 مجند2.50.000 مقاتل، 120 طائرة.

واتە شایستەی ئەوەبوە ناو لێنرێ جەنگی جیهانی مادام وولاتانی پیشرەو هەرهەموی کەوتنە جەنگ وهاوپەیمانی ، لەجەنگی جیهانی دوەم ژمارەی هاوپەیمانان گەیشتە 50 وولات .

لەدوای ئەو جەنگە جۆرە دیزاینێکی تر لەهاوپەیمانی دێتە دی کە زیاتر سەردەمی جەنگی ساردی پێدەووترێت ،ئەو دابەشیە, وولاّتانی سوشیالیستی وولاّتانی سەرمایەداری دووست بوو کە گەورەترین دابەشی نێودەولّەتیە،زیاتر لە فەترەی دوای جەنگی جیهانی دوەم دەست پێدەکات تا سالی 1990 وکەوتنی شیوعیەت بەیەکجاری .

لەو دابەشیە دیسان ئەوروپا لێی سەنتەرە لەهاوپەیمانی ،یەکیتی ئەوروپی لێدروست بوویەوە ،لەدوای جەنگی جهانی دووەم لە1958لە روما بیروکەی ئەو یەکیتیە زیندوو کرایەوە بەناوی (کۆمەڵەی ئەوروپی )، لەدوای دارمانی شیوعیەت لە ساڵی1990 زیاتر بنەماکانی یەکێتی ئەوروپی بەرجەستە کرا لە ( واستریخ) و کرا بە ( یەکێتی ئەوروپی )، ئێستا دراویشیان یەکخست، کۆمەڵێك مەرجی مرۆڤایەتیو سیاسی تیایە بۆ وەرگرتنی هەر ولاّتێك لەو یەکێتیە، هەر بۆیەش تورکیا هەولیکی زۆری دا وەرنەگیرا ئەگەرچی ئەندامیشە لە ناتۆ ، بیل کلینتۆن لە بیرەوەریەکانی خۆی لە کتیبی(حیاتی) دەلێت سلیمان دیمریلی سەرۆك کۆماری تورکیا پێی ووتم تورکیادەکەینە پردی نێوان رۆژهەلات ورۆژئاوا پیم ووت برۆن کیشەی کورد چارەسەر بکەن ئینجا ئەوە بکەن[1749] ، ناتوانێ ئەو مەرجانە بسازێنێ و وەرگیرێ، یەکێتی ئەوروپی رەوتێکی سروشتی ئەو عەولەمەیە و سەلماندنی ناسنامەی بەکۆمەڵە . ئێستاش گەرم و گورن و بریتین لە(قبرص- بلغاريا-رومانيا- أنجلترا – ايرلاندا –مالطا- يونان- ايطاليا – اسبانيا –برتغال – فرنسا –سولفنيا –النمسا –هنغاريا-سولفاكيا-لاتوانيا-لاتفيا-استونيا –فنلندا-سويد –دنمارك – هولندا –بلجيكا –المانيا –تشيك- لوكسومبروج –بولندا ) .

---

+ بلجيكا:380000 مجند، 170000 مقاتل، 134 طائرة

[1749] بیل کلینتون –حياتى ص953 .

**هاوپەیمانیە دەولیەکانی ئیستا**: واباوە کە دیپلۆماسیەتی کۆن تەنها بریتی بوە لە هاوپەیمانیەکان ، ئەگەر بەو ڕەهاییەش ڕاست نەبێت ئەوە پانتاییەکی فراوانی دیپلۆماسیەت بریتی بوە لە نزیك بوونەوەی دوو لەدژی سێ ،هاوپەیمانی چەندلایەك دژ بە چەندلایەکی تر ، بەلام ئیستا ئەو شێوازە گۆڕدراوە ،دیپلۆماسیەتی نوێ تاڕادەیەك هاریکاری وبەهاش دەگرێتەوە ،بۆیە هاوپەیمانیەکانی ئیستا ئەوەندە ئەکتیڤ نین.

لە بارودۆخی ئێستا ئەو هاوپەیمان و تەکەتولە دەولیانەی خوارەوە هەیە:(1-یەکێتی ئەوروپی.2-ناتۆ.3- وارشۆ 4-ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی. 4-جامیعەی عربی.5-ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی. 6-وولاّتانی بێلایەن.7-فرانکۆفۆنی.8-کۆمنویلیس9-وولاّتانی کەنداو....)،دابەشی تریش هەیە لەسەر بنچینەی داهاتی ئابووری, وولاّتانی سەروو, وولاّتانی خواروو جهانی سێیەم, بێ ئەوەی هاوپەیمانی هەبێت، سەرجەمیش لە نەتەوە یەکگرتوەکان ئەندامن بریتیین لە 193 وولاّت...لەسەرهەندیك لەو هاوپەیمانیە گرنگانە دەوەستین :

1- هاوپەیمانی ناتۆ : لەسەرەتا لە هاوپەیمانی برۆکسلی1949 و دوای بوە هاوپەیمانی ئەتلەسی و ناتۆ دژ بە شیوعیەت بارەگاکەی لە برۆکسلە ، میساقەکەیان لە 24 /8/ 1949م لەگەل ئەنجومەنێکی بالای سەربازی ، پشتی بەمادەی مادەی 51ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان بەستوە بۆ دروست بوونی ،دامەزرینەرانی 12 وولات بوون( بریتانیا، فرنسا، وبلجیکا، وهولندا، ولوکسمبورغ، ئەمریکا،کەنەدا، پورتغال، دانمرك، نروج، ئیتالیا، ئایسلندا.)دوای تورکیاو یۆنانیش لە سالی 1952 وئەلمانیای رۆژئاواش 1955هاتەنێوی بوە 15 وولات ،بە هاتنی ئیسپانیا لە 1982 بوە 16 وولات ،هەر لە زیاد بوونە تائیستاش 28 وولاتی تیدایە ، هەندێ ووردە هاوپەیمانی ترلەو چوارچێوەیە کرا ،لەوانە:حلفی سەنتۆ ،حلفی بەغداد،پەیماننامەی خوارووئاسیا..هتد .

2-هاوپەیمانی وارشۆ: لەبەرامبەر ناتۆ هاوپەیمانی وولاتانی شیوعی سەر بە سۆڤیەت هاتە کایەوە لەسالی 1955، بەبەشداری وولاتانی (ئەلمانیای رۆژهەلات، بـولنـدە، چیکوسلوفاکیا، هەنگاریا،

یوغسلافیا، ألبانیا، بلغاریا، رومانیا.) هەمویان بەگشتی وتاك تاكیش بە هاوپەیمانی تر بە سۆڤیەت گریدرابوون ، ناوی نرابوو (علاقات الصداقة والمساعدة المتبادلة بين الاتحاد السوفييتي ودول الديمقراطية الشعبية) ، لەسالی 1956 یەکەم کۆنگرەیان بەست وهاوپەیمانی وارشۆی لیّهاتە دی ،وەك ئەوەی ناتۆ هاوپەیمانیە سەربازیەکەی بەسەر زال بوو ، مادەی (5)ی میساقی وارشۆ بریتی بوو لەپیکهینانی سەرکردایەتیەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی مارشالی سۆڤیەتی (کۆمینیڤ)[1750] .لەسالی 1968 ترازانیکی نیّوان چین وسۆڤیەت هاتە کایەوە هاوپەیمانیەکی تر بەسەرۆکایەتی چین دروست بوو ئەلبانیا لەوسالی کشایەوەو چوە پال هاوپەیمانی چین .

3-هاوپەیمانی کۆنگرەی ئیسلامی : ئەو هاوپەیمانیە لە سالّی 1971 لە ( جدە)ی سعودیە دروست بووە، هەندیك هەولّ و تەقەلاّیە دەگیّڕیّتەوە بۆ سآی 1954، خاوەنی میساقیّکن وەك پالّپشتی گەلانی موسولّمان بۆ سەربەخۆی، هاریکاری ئیسلامی، قەلاّچۆی رەگەز پەرستی، بەکارنەهیّنانی چەك و توندو تیژی بۆ کیّشە ناوەکیەکان، .. بەلاّم هیّزی جیّ بەجیّ کردنی لاوازە، لەهەر (3) سالّیّك کۆنگرەیەکی سەران دەکریّ نزیکەی(55) ولاّت ئیّستا بەشدارن .

4-هاوپەیمانی یەکیتی ئەفریقی : لەسالّی 1963 لە ( ئەدیس ئەبابەی ) پایتەختی حەبەشە دروست بوو لەلایەن (30) ولاّتی ئەو سەردەمی، ، هەندیّ مەرجی مرۆڤانەو دپلۆماسیانە دارِیّژرا ..، تا ئیّستاش بەکارە پیّچەوانەی ، سالاّنە کۆبوونەوەیەکی سەرانی دەکا.

5-هاوپەیمانی یەکیتی ئەوروپی : تەقەلای یەکبوونی ئەوروپا زور کونە، هەرلەدوای جەنگی سی سالەی ئەوروپی لە 1523 لەلایەن (ئیمریك کروچیە) ئەو داوایە کراوە، دوایش لە 1548 لە ویستیفالیای روژئەوای ئەلمانیا بناغەی خانەوادەی ئەوروپی پیك هات، ئیتر لەو کاتیەوە لەهەول وتەقەلادان تا جیهانی ئیسلامی لیك بکەنەوە ئەوروپاش یەك خەنەوە ، لەدوای جەنگی جهانی دووەم لە1958لە روما بیروکەی ئەو یەکیتیە زیندوو کرایەوە بەناوی (کۆمەلّەی ئەوروپی )، لەدوای دارِمانی شیوعیەت لە سالّی1990 زیاتر بنەماکانی یەکیّتی ئەوروپی بەرجەستە کرا لە ( واستریخ)

---

[1750] التاريخ الدبلوماسي ص235. تاريخ السياسة الخارجية ص70،ص340 .

و كرا بە ( یەکێتی ئەوروپی )، ئێستا دراویشیان یەکخست، کۆمەڵێك مەرجی مرۆڤایەتیو سیاسی تیایە بۆ وەرگرتنی هەر وڵاتێك لەو یەکێتیە .

6-هاوپەیمانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو -مجلس تعاون الخلیجی : لەدوای سەرکەتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێرانی ی 1979 و هەڵگیرسانی جەنگی عێراق – ئێران لە1980، ئەو ئەنجومەنە بەڕەسمی لە مانگی ئایاری 1981دروست بوو، هەموو وڵاتانی کەنداو ( جگە لە یەمەن ) ی تیایە، هەر (3) ساڵ جارێك ئەمینداری گشتی هەڵدەبژێرێتەوە، لە داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا ، هەروەها پێشتریش لایەنگیری عێراق کرد لەدژی ئێران و کوردیش، بەڵام بۆ کێشە ڕاستەقینەکانی عەرەب بەرامبەر ئیسرائیل و کێشەکانی تری عەرەب لەگەڵ تورکیاو حەبەشەو ... ئەو ڕۆڵەی نەبووە.

7-هاوپەیمانی وولاتانی بێلایەن: یەکەم جار لەسەر پیشنیاری سەرۆکانی یۆگوسلاڤیاو هندو میسر(تیتۆ-نهرۆ-ناسر) وولاتانی بیلایەن لە ململانیی رۆژهەلات ورۆژئاوا دروست بوو ، بڕیاری دروست بوونی لە سالی 1955ی کۆنگرەی باندۆنگی (ئەفرۆ ئاسیەوی) درا 29 دەولەت بوون ،دوایی زیاتر لە 104 دەولەت بوونە ئەندام، یەکەم کۆنگرەیان لە سالی 1961لە بەلگراد بەست 25 وولات بوون ، لە کۆنگرەی دوەمیان لە قاهیرە 1964 گەیشتە 47 وولات،لە کۆنگرەی سێیەمی لۆزاکا 1970گەیشتە54 وولات، لە کۆنگرەی چوارەمی جزائیری 1973 گەیشتە 75 وولات، لە پینجەمی کۆلۆمبۆی سالی 1976گەیشتە 87وولات، لە شەشەمی هاڤانای سالی 1979 گەیشتە 92وولات ، لە حەفتەم لە نیودەلهی گەیشتە 102 وولات ،هەشتەم لە1986 هەراری و نۆیەم لە بلگراد 1989، دەیەم جاکارتا 1992،یازدەم لەکارتاجینا لە 1995،دوازدەم لەدیریان 1998،دوازدەم 2003 و کۆتایی لە کوالالامپور 116 وولات بەشدار بوون ، لە پیگەی (تۆڕی هەوالی وولاتانی بیلایەن –NNN) 120وولات تۆمارکراوە، ئیستا لەدوای داڕووخانی سۆڤیەت ئەو هاوپەیمانیەش زۆر لاوازبوە .

8-هاوپەیمانی فرانکۆفۆنیە : پێکهاتووە لەو وڵاتانەی کە بە زمانی فەرەنسی دەدوێن، زۆربەی وڵاتە ئەفریقیەکانن، لە 7/ ئەیلول/1961 وڵاتانی فرانکۆفۆنی یەکێتیەکیان پێکهێنا بەناوی : یەکێتی ئەفەریکی مەلیگارسی(.AMU) 12وڵات بوون ئەو ساتی سەربەخۆییان وەرگرتبوو ( کامیرۆن، کونگو، برازاڤیل، ساحل العاج، داهومی (بنین-ئێستا)، گابون، بۆرکینۆفاسۆ، موریتانیا، نیجر، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، سەنیگال، تشاد، مدغشقە، ) یەکەم کەس کە بەکاری هێناوە ( لوبولد سیدار سنغور )ی سەنیگالی بوو لە 1962لەدوای بەکاربوونیەوە لە 1991، ئێستا ( 50 ) وڵاتی تیایە، 7 وڵاتی عەرەبیە وبەشێکی ئاسیاوی و ئەوروپییش.

9-هاوپەیمانی کۆمکاری عەرەبی(الجامعە العربیە): سەربردەی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ 7/ئۆکتۆبەر/1944کاتێ لیژنەی ئامادەکاری لە ئەسکەندەریە پرۆتۆکۆلێکی مۆرکرکرد بۆ پێك هێنانی جامیعە،تیایدا وولاتانی عەرەب کۆ دەکاتەوە بە پلەی سەفیر ، لە22/مارس/ 1945میساقی جامعە کە پێك هاتبوو لە 20 مادە جاڕ درا و سەرەتایەکی ئەو زانکۆیە داڕێژرا لە نێوان ( میسر، عێراق، سوریا، شرق ئوردن (ئوردەن)، سعودیە، لوبنان، یەمەن)، دوای لە 18/ینایر/1953 سودان ،لە 28/مارس/1953 لیبیا ، لە1/سپتمبر/1956 تونس ،لە 1/سپتمبر/1956 مەغریب ،لە 20/یۆلیۆ/1961 کوێت ،لە 16/ئۆگست/1962 جەزائیر هاتنە ڕیزی، لەدوای ئەوانە هەریەکە لە یەمەنی میلی لە 1967 وبەحرەین لە 1971،عومان لە 1971،ئیمارات لە 1971، مۆریتانیا لە 1973،سۆمال 1974،فلستین 1976،جیپۆتی 1977،جزر القمر 1993،دوای ئەوەی هەردوو یەمەن یەکیان گرت مانەوە 22 دەولەت، هەڵبەتە ئەو زانکۆیە هەر لە ئەنجامی ئەو شکست و پەرتەوازەیەی ڕێکەوتنی سایکس بیکۆ – 1916و هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت هاتە کایەوە، تا گەیشتنە هەڕەشەکانی ئیسرائیل لە سەر عەرەب، لە ساڵی 1963 یەکەم دانیشتنی سەرانی عەرەب بەسترا، .چەندین تەکەتول هاوپەیمانی تریش لەو چوارچێوە هەیە ، لەوانە ( یەکێتی مەغریبی عەرەبی UAM-مەغریب، جەزائر، تونس، لیبیا، موریتانیا، لە 17/ فبرایر/1989 لە مەراکش دروست کرا ) هەروەها (ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەگەڵ چەندین تەکەتولی تری عەرەبی سەری هەڵداوەو پوکایتەوە لەوانە (جبهە الصمود والتصدی ) و

( دول المواجهه)..كه هەمو ئەوانه نيشانەی ئەوەن كۆمكاری عربی ئەوەنده به هێزنەبوه هاوپەيمانی تر بتوينيتەوه .

10-هاوپەيمانی كۆمنويلس: ئەگەر فرانكۆفۆنی بۆ فرنسيه زمانەكان بێت ،ئەوا كۆمنويلس بۆ ئينگليزيه زمانەكانی جيهانه ،پێيان دەووتريت (رابطة الشعوب التي تتكلّم الإنجليزية)، يەكەم جار بناغەكەی لەنێوان بريتانياو كەنەدا لەسالی 1867دروست بوو ، له بنەماكانی ويستيمينتەری سالی 1931 كۆمۆنويلس قەبوول كرا،بۆ ئەو وولاتانەی جۆريك سەربەخۆييان هەيەو له چوارچيوەی دەسەلاتی بريتانی[1751]،تاله سالی 1968پێك هاتبوو لەو وولاتانه : بريتانيا، وندا، ئوستراليا، نيوزيلنده ، هند، باكستان، سيلان، غانا، ماليزيا، نيجيريا، سيراليون، قبرص، مالگه، تانزانيا، جامايكا، ترينداد ، توغو، أوغنده، وكينيا، مالاوى، زامبيا، غامبيا، سنغافوره، غوايانا، ليسوتو، بوتشوانا، بارباد، مالديف، ناورد، ساموا الغربيه، جزيره موريشيوش، سوازيلاند. ).

سروشتی هاوپەيمانی : ليكنزيك بوونەوەو هاريكاری كارێكی مرۆييه ،له ئاينا دوو جۆر هاريكاری هەيه هاريكاری بۆ چاكه وهاريكاری بۆ دەستدرێژی (وتعاونوا على البر ولاتعاونو على الاثم ..)، زۆر بەدەگمەن هاوپەيمانه دەوليەكان جۆری دوەم بوه ،زۆربەی جار بۆ دەست درێژی وجەنگ بوه،زياتر لەوەش ڕای (جۆن فيزكاس) ئەوەيه كه هاوپەيمانی هەرگيز ئاشتی ناهێنيته دی ،بەلكو بەشێكه له خۆ ئامادەكردن بۆ جەنگ[1752]،ڕەنگه بەو ڕەهاييه نەبێت جاريش وايه هاوپەيمانی دادگەريانه ڕێ له جەنگ وپشێوی دەگری،بەلام زۆر بەكەم به واقعی ئەو جۆره هاوپەيمانيه خەيريه بينراوه ، واته هاوپەيمانه مرۆييەكان هەيه له ئيستاش بەلام ئەو ناوەشی لێنەنراوه ،ئەو هاريكاريانه له شێوەی پاراستنی ژينگه مافی مرۆڤ مافی ئافرەت منداڵ هەژار ..هەيه ،ناوی نەنراوه هاوپەيمانی ،لەسەر ئەو بنچينەيه هاوپەيمانی جيايه لەگەڵ ڕێكەوتنامه نێودەوڵەتيەكان،هەروەهاش لەگەل كۆنفدرالی نێودەولەتی ، ڕێكەوتنەكان سەرچاوەيەكی ياسايی دروست دەكەن بۆ گشتی, هەرچی هاوپەيمانيه

---

[1751] العالم في القرن العشرين ص84 .

[1752] ) Paul Viotti , Mark V . Kauppi , International Relation Theory : Realism , Pluralism , Globalism , And Beyoud ( Boston : Allynand Bacon , 1997 ) , PP .19 – 20

تەوەری نێودەوڵەتی لێ دروست دەبێت، ئەوانەی دوای کەم تر نیگەرانی دەولی لێدروست دەبێت ،بۆ نمونە لە ریکخراوی بازرگانی جیهانی ژمارەی ئەندامانی گەیشتۆتە 109 وولات لە چوارچێوەی بازاڕی ئازاد ،کاریگەریەکانی هەڕەشەی ئاشتی دەولی نیە ، هەرچی هاوپەیمانیە زیاتر بارە سەلبیەکەی وەرگرتوە ،هەر لەڕاستیشدا ئەو شوێنانەی هاوپەیمانی سەربازی لێبێت ئارامی تیکدەچێ ،ئۆتۆماتیکیانە هەڕەشەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەو لایەنانەی کە ئەندام نین .

لەسەر ئەو بنچینەیە سیاسەتی گشتی هاوپەیمانی دەولی ئەوەیە ناکرێت ئەندامیکی هاوپەیمانی سەربازی لەهەمان کات ئەندام بێت لە هاوپەیمانیەکی تر بەخێرایی لایەکیان تیکدەچێ ، بۆیە لەکۆنەوە (میکافیلی) وتویەتی ئەگەر ئەندامێکی هاوپەیمانی هەمان هاوپەیمانیەتی لەگەل لایەکی تر بکاتەوە هاوپەیمانی یەکەمی لاواز دەبێت ،نمونەیەکی نزیکمان هەیە لەکوردستان کە چارەنوسی لایەك ئەندام بوو لە دوو هاوپەیمانیەتی چی بەسەر دێت، لەساڵی 1980 لەدوای هەڵگیرسانی جەنگی عێراق و ئێران لە کوردستان دوو هاوپەیمانی دروست بوو یەکەم بەرەی نیشتمانی نەتەوەی دیموکراسی(جوقد) کەلە 11/2 /1980 لە دیمەشق دروست بوو، پێك هاتبوو لە:یەکێتی- شیوعی- بەعسی سەر بە سوریا،دوەمیان بەرەی نیشتمانی دیموکراسی (جود) لە1981/1/28 جاڕدرا پێك هاتبوو لە: پارتی -حسك- شیوعی ،حزبی شیوعی چوە هاوپەیمانی دوەمیش ، واتە لەیەك کاتدا لە هەردوولا ئەندام بوو، ئیتر نەك هاوپەیمانەکەی لەگەل یەکەم بە خێرایی تێك چوو ،بەلکو کارەسات ڕوویداو بوە شەڕی برا کوژی و زۆرترین زیانیش بەر حزبی شیوعی کەوت بەتایبەتی لە شەڕی قڕناقەو پشت ئاشان [1753].

کەواتە هەمو هاوپەیمانیەك بەرگەی بەهیزی مانەوەشی نیە ئەگەر کۆمەڵێك هۆکاری گونجاویان لە نێوان نەبێت ،وەك(بەرژەوەندیە بنچینەییەکان- توانای جێبەجێکردنی هاوپەیمانیەکە –ویکچوونی ئایدیۆلۆجی ونەزەریە سیاسیەکانیان )،ئەگینا دەبێتە هۆی هەلوەشانەوەی هاوپەیمانی کەلەلایەن تویژەرەوان تیکچوونی هاوپەیمانی بۆ ئەو هۆیانەیان گێڕاوەتەوە :

1-نەهینانەدی ئامانجەکانی هاوپەیمانیەتی 2- نەگونجان لەگەل پیشهاتە دەولیەکان کەلە دوای

---

[1753] بڕوانە (ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان) .

هاوپەیمانی بە ئاڕستەیەکی جیاتر لە نەخشە ریگەی هاوپەیمانیەکە 3- زال نەبوون بەسەر گرفتەکانی دێتە پیش 4-جار وایە بەرژەوەندی لایەك یان چەند لایەك دەگۆڕێ وناگونجێ لەگەل ئامانجە گشتیەکانی هاوپەیمانی ...

لەسەر ئەو بنچینەیە جار وایە هاوپەیمانیەکی کاتی سەر سوڕهێنەر دروست دەبێت ،یان جار وایە لە هاوپەیمانیەوە لەناکاو دوژمنایەتیەکی سەرسوڕهێنەر دروست دەبێت ،ئەو دۆخە زۆر لە ناو وولاتانی عربی دروست دەبوو ، لەسەر ئەوبنچینە بێبنچینەیە لە ناو وولاتانی عربی زۆرترین هاوپەیمانی وتەکەتول کراوەو تێکچوە ،هەر لە یەکگرتنی میسر لەگەل سوریاو عیراق وجاریکی تر لەگەل لیبیاو سودان وئینجا عیراق لەگەل ئوردەن ولەگەل سوریاو ..ئینجا هاوپەیمانی (جبهةالرفظ)و دوای (جبهە الصمود والتصدی - ئەو بەرەیە لە پەراویزی کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی سالی 1978ی بەغدا پیکهات لە وولاتانی(عراق-لیبیا –ریکخراوی رزگاری فلستین –سوریا)، و زۆری تر،جاریش وابوە هاوپەیمانی دژ بەیەك کراوە لە 1958/2/1 میسرو هاوپەیمانیان بۆ یەکگرتن کرد دوای 13 رۆژ ئوردەن وعیراقیش هاوپەیمانیەکی هاوشیوەی ئەوانیان ڕاگەیاند،کاتی خۆشی لە ئەوروپا زۆر ڕوویدەدا، لەسەر ئاستی نێودەولەتیش نمونەی لە کاتی جەنگی جیهانی دوەم هاتە کایەوە ، ستالین(سۆڤیەت) هاوپەیمانی لەگەل هتلر(ئەلمانیا) کە بە(حلف مولوتۆڤ-ریبنترۆپ ) یان( ستالین –هیتلەر) ناوزەد دەکرا، کە لە 24/ئۆگست/1939 گریدرالە مۆسکۆ، تا 22ی یۆنیۆی 1941 تیکچوو بەخیرایی وەرچەرخا بۆ دژایەتی وبوە جەنگی جیهانی نێوانیان ، ،ئەوجارە بۆ هاوپەیمانی نیوان یەکیتی سۆڤیەت ورۆژئاوا دژ بە ئەلمانیا ، دوای نەمانی ئەلمانیائەوهاوپەیمانیەش بەخیرایی تیکچووئەوجارەهاوپەیمانی بوە دوو سەربازگەی جیهانی رۆژئاوایی و رۆژهەلاتی و هەلگیرسانی جەنگی سارد.

زۆربەی جار بەرامبەر هاوپەیمانیەك هاوپەیمانیەکی دژ کراوە ،هەروەك لە نمونە دەولیەکانی سەروو باس کرا ،نلتۆ پەیدا بوو وارشۆش لە بەرامبەری پەیدا بوو ، لەسەر ئاستی بچوك تر وناوەخۆیش ،نمونەی عربی لە نێوان میسرو سوریا هاوپەیمانیەك کرا لە 1958/2/1 کرا لە بەرامبەردا هاوپەیمانیەکی(بنەمالەیی) لەنیوان عیراق وئوردەن کرا لە 1958/2/14 واتە 13رۆژ دوای هاوپەیمانی یەکەم ،دوای لە شۆرشی 14ی تموز هەلوەشایەوە ،دوای سعودیە لە ڕکی ئەوانە هاوپەیمانیەکی لەگەل ئیران وتورکیا پیکهێنا .

ڕەوایی هاوپەیمانی (مەسالیحی ومەبادیئی): هەلبەتە وەك لەسەروو دیاری کرا دوو جۆرە هاوپەیمانی هەیە ،هاوپەیمانی لەسەر هەق (تعاون علی البر)،هاوپەیمانی دوەم لەسەر بنچینەی زولم ودەست درێژی (تعاون علة الاثم) ، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە بنەماکانی رۆژئاوا بۆ هاوپەیمانی یان بنەما میکافیلیەکان دەبینین بە ئاشکرا هاوپەیمانی جۆری دوەمە ،واتە لەسەر دەست دریژی و(الاثم)ە ، هاوپەیمانی بەفراوانی مانای لێك نزیك بوونەوەی دوولا یان زیاتر بۆ هێنانەدی چەند ئامانجیکی هاوبەشە لەسەر حیسابی سێیەم، بنەمایەکی دەولی زۆر بلاو هەیە دەلیٚ ئەگەر یەك کەس هەبوو ئەوە ئاشتی هەیە ،ئەگەر بوە دوو ئاشتی تێکچوو ململانێ سەرهەلدەدا،ئەگەر بوە سێ هاوپەیمانیشی لەگەل دروست دەبێت لەنێوان دوان دژ بە سێیەم ،ئەوەیان ڕێك لەگەل ڕێساکەی (مارکیز) دێتەوە کە دەلێت:(پێك گەیشتنی دوو بەرژەوەندی دەبیٚ جیا بێت لەگەلٚ سێیەم) ، ئەو بنەمایانە جاروایە ژێرخانی ئاینیشی بۆ دادەڕێژرێت، لە(قاموس الخرافات)دەلێت هاوپەیمانی لە ئاسمان ولە نێوان خواوەندەکان هەبوە ....مانگ گیران لە ئەنجامی شەڕی نێوان ئان وساندیت دێت، سان پاریزگاری مانگە وهاوپەیمانە لەگەل شاماشی پاریزەرو خواوەندی رۆژ شەرەکەشیان لەسەر دەسەلاتە بەسەر هەمو جیهان[1754]، هەرچەندە ئەوە ڕوانگەی عەلمانی و بنەمای میکافیلیە بەلام ئەزمونی مێژوو پێمان دەلێت کە ئەو جۆرە هاوپەیمانی خۆڕاگرو ڕەسەن تر بوە لە هاوپەیمانیەك لەسەر بنەمای مەبادیئی تالەسەر حیسابی سێیەم نەبێت ،لەکۆنەوە گەورەترین کیشە لە نێوان مەبادیئو مەسالیح ئەوەبوە مەسالیح زال بوە ،بەتایبەتی لە تەعامولی دەولی ،جاروایە لە تەعامولی شەخسی مەبادیئی زال بوە ،ئەوهێزەش کەویستویەتی بەپێی مەبادیئی بەرامبەر دوژمنەکەی هەلس وکەوت بکات عادەتەن تێکشکاوە بەرامبەر ئەوانەی هاوپەیمانی لەسەر بنچینەی مەسالیح کردوە .،چاکترین نمونە ململانێی نێوان ئیمامی علی ومعاویە ،کە یەکەمیان پابەند بە مەبادیئو دوەمیشیان پابەند بە مەسالیح وای کردیەکەم شکست بهێنی ، (مارکیزدار جنستون)ە کە دەلێ: ئەو کاتە دوو بەرژەوەندی یەك دەگرن کە دژ بە سێیەمە،واتە بەرژەوەندی هاوبەش لە جیایی بەرژەوەندیە دژ بەیەکەکان دێت ، جهانی هاوچەرخ وعەلمانی لەسەر ئەو بنچینەیە داڕژراوە(لەسەر بنچینەی مەسالیح) جەنگەکانی

---

[1754] قاموس الخرافات ص11 .

جیهانی ودابەشیەکان ومەینەتی کوردو فلستین ومیلەتانی ژێر دەستە لەو بنەمایانە هاتوە کە هەمان بنەمای (مصائب قوم عند القوم فوائد..) بە پێچەوانەی (مثل المؤمنون...) .

ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوجۆرە هاوپەیمانیانەی جۆری دوەم(مەسالیح) زیاتر بەرگەگرترو خۆڕاگر تروباوترە،ئەوەی یەکەم تەمەنی کورت تربوە، هاوکیشەیەك هەیە گوزارش لەو پەیوەندیە پیچەوانەییە دەکا ،ئەویش ئەوەیە تا تەعامول سادەتر بێتەوە باشتر دەتوانی مەبادیئی بیت ، پیچەوانەش تا ئالۆزترو گەورەتر بیت زیاتر مەسالیحی دەبیت،بەو شێوەیە دەتوانی وەك تاك لەگەل تاك تەعامولی مەبادیئی بکەی بەلام کە بوە کۆمەل وحزب ودەولەت ئەوە زیاتر مەسالیحی دەبێت ، جا چارەیەك بۆ ئەو دۆخە دۆخی تێکگیرانی مەسالیحی ومەبادیئی دۆزرایتەوە، ئەویش (تاکتیکە) یان مەزهەبیەکان پێی دەلێن (توقیە) ،یان (خدعە)، ئیتر هەردوو چەمکی تاکتیك وستراتیژ لەوەوە بە فراوانی سەری هەلدا یەکەم جار ئەگەر ئەو دووناوەشی نەبووبێت ،هەرلەوەوە ئەو هاوپەیمانیانەی زیاتر ستراتیژین ڕەواترن لەوانەی زیاتر لەسەر تاکتیکن .

لیرەوە هەلوەستەیەکی پێویستە لە جۆرە هاوپەیمانیەك پێی دەووترێ (هاوپەیمانی ستراتیژی)کەلەئەنجامی کاروکاردانەوەی هاوپەیمانیەکی تر نیە ،بەلکو هەرقولاوی ئامانجە دوورەکانە ،ئەویش لە ئەنجامی هەلسەنگاندنی باری (ئیقلیمی –جیهانی ) یەکەکە توخمەکانی پیکهێنەری سیاسی بۆ دەکەی ،دوای شێکردنەوەی سیاسی بۆ دەکەی لەسەر بنچینەی زانیاری وورد، هەلدەستێ بەدۆزینەوەی ستراتیژی سیاسی،ئەوەش زۆر پێویستی بە زانیاری وورددەبێت لە نهینیە سیاسیەکان و فلسفەی سیاسی کۆمەلگەش هەبێت ،بۆیە بەگشتی کۆمەلیك ئەگەر دیراسە دەکرێت نەك یەك .

ئینجا پیویستیە ناوەکیەکان شان بە شانی دەرەکی پێویستی بەوەها هاوپەیمانیەك دەبێ کەلەو قوولاییەی دەولی وئیقلیمی هینانەدی ئامانجەکانتان لیك نزیکە ، لەدەست نیشان کردنی ئەگەرەکانی پەیوەندیدار بەخۆی (یان ئەو ئەگەرانە هەلدەبژێری کە لەو ئامانجانەی نزیکە) ، کرۆکی هاوپەیمانی ستراتیژیەکەی لەوەوە دەبێت کە بەلایەنەکانی هاوپەیمانی پێکەوە هەولدەدەن ئەگەرەکانی ڕوودانی واقیع بەرەو ئەو ئارستەیە دەبەن کەخۆیان دیانەوێ وبەرژەوەندی هاوبەشی لایەنەکانی هاوپەیمانی دێتە

دی ، ئیتر لەو پرۆسانە پرسی ئەوەلی وسانەوی (ترتیب الاولویات)دیاری دەکرێت ،پرسی قۆناغبەندی ،پرسی دۆست وناحەزو دوژمن ...تادەگاتە هاوپەیمانی لەگەل زۆر پرسی تر  کە لەو چوارچێوەیە بە ووردی دیاری دەکرێت.

کۆتایی هات